# کیمیای بەختەوەری

(کیمیای سعادت)

نووسەر:

## ئیمام ئەبووحامید محەممەدی غەزالی تووسی

(٤٥٠-٥٠٥ ک.م)

وەرگێڕ:

## فەخرەدین ئامێدیان

سرشناسه: غزالی،محمد بن محمد، ۴۵۰- ۵۰۵ ق.
عنوان قراردادی: کیمیای سعادت، کردی
عنوان و نام پدیدآور: کیمیای بەختەوەری (کیمیای سعادت)/نووسەر: ئەبووحامید محەممەدی غەزالی تووسی، وەرگێر فەخرەدین ئامێدیان (ترکی).
مشخصات نشر: سنندج، شمیم سنندج، ۱۳۸۸.
مشخصات ظاهری: ۹۰۴ ص.
شابک: ۹۷۸-۶۰۰-۹۱۱۴۸-۵-۶
وضعیت فهرست نویسی: فیپا
موضوع: اخلاق اسلامی- متون قدیمی تا قرن ۱۴.
موضوع: تصوف - متون قدیمی تا قرن ۱۴.
موضوع: نثر فارسی —قرن ۵ ق.
شناسه افزوده: آمیدیان، فخرالدین (ترکی)، ۱۳۵۶-، مترجم
ردەبندی کنگره: BP ۲۴۷ /۳۵ /غ۴ ک ۹ ۱۳۸۸ ب
ردەبندی دیویی: ۲۹۷/۶۱
شماره کتابشناسی ملی: ۱۹۵۶۴۳۹

# کیمیای بەختەوەری (کیمیای سعادت)

**نووسەر** : ئیمام ئەبووحامید محەممەدی غەزالی تووسی

**وەرگێڕ**: فەخرەدین ئامێدیان(تورکی)

**هەڵەگری**: لەیلا جەهانی+ رەئووف مەلایی

**تایپ**: سەیران پەرویزی+ وریا دیوانی+ رەزا تورکی

**رووی بەرگ**: خالید مەهدەویان

**ناوەوەی بەرگ**: فەخرەدین ئامێدیان

**بلاوکردنەوە**: شەمیم سەنەندەج

**ژمارەی چاپ**: یەکەم

**تیراژ**: ۳۰۰۰ دانە

**نرخی** ۱۵۰۰۰ تمەنە



**ناوەندی بلاوکردنەوە: سنە-شەقامی شوهەدا- پاساژی ئاوێەر- کتێبی نیشتمان**

**تەلەفوون: ۰۸۷۱-۲۲۷۲۱۱۵**



**پێشکەش بە دایکم، فریشتە**

کە دەنگی گەرمی فریشتە ئاسای، ئێستاش تەم و دووکەڵی ئاوێنەی دڵم دەشواتەوە.

**پێشکەش بە باوکم، عەبدوڵڵا**

کە فێری کردم بێجگە لە خوا، عەبدایەتی کەس نەکەم.

**پێشکەش بە خێزانم، لەیلا**

کە وەکوو هەتاو، تەم و مژێ ژینی پڕ لە ژان، ناتوانن بەربەستی تیرێژی خۆشویستنی بن.

# ناوەرۆک


دەسپێک ........ XXI
ژیانی غەزالی ........ XXVIII
سەرەتا ........ ١
سەرنج ........ ٣
پێرستی ئەم کتێبە ........ ٥
شرۆڤەی سەردێڕی موسوڵمانی ........ ٧
سەردێڕی یەکەم: خۆناسین ........ ٨
بەشی یەکەم: جەستەی ڕواڵەتی و مانای ڕۆح ........ ٩
بەشی دووەم: ناسینی ڕاستەقینەی دڵ ........ ١٠
بەشی سێهەم: ڕاستەقینەی دڵ ........ ١٠
بەشی چوارەم: دڵ خوونکاری لەش ........ ١٢
بەشی پێنجەم: لەشکری دڵ ........ ١٣
بەشی شەشەم: دەسەڵاتداری دڵ ........ ١٤
بەشی حەوتەم: بنەماکانی چاکە و خراپە لە مرۆڤدا ........ ١٥
بەشی هەشتەم: ڕاگەیشتن بە سەر هەڵس و کەوتەکانی خۆدا ........ ١٦
بەشی نۆهەم: ڕەچەڵەکی مرۆڤ گەوهەری فریشتەکانە ........ ١٧
بەشی دەهەم: سەیرو سەمەرەکانی جیهانی دڵ ........ ١٩
بەشی یازدەهەم: پێوەندی دڵ دەگەڵ جیهانی سەروو ........ ٢١
بەشی دوازدەهەم: مرۆڤ لە سەر فیترەتی دێتە دونیا ........ ٢٢
بەشی سێزدەهەم: شەرەفی دڵ بە هۆی هێزەوە ........ ٢٣
بەشی چواردەهەم: ڕاستەقینەی پێغەمبەری و جێنشینی ........ ٢٥
بەشی پانزدەهەم: پەردەی ڕێگا ........ ٢٦
بەشی شانزدەهەم: بەختەوەری مرۆڤ لە ناسینی پەروەردگارایە ........ ٢٨
بەشی هەڤدەهەم: سەیرو سەمەرەکانی چێ کردنی مرۆڤ ........ ٢٩
بەشی هەژدەهەم: ئەوپەڕی بێ‌هێزی و نوقسانی مرۆڤ لە دونیادا ........ ٣٢
سەردێڕی دووەم: لە ناسینی پەروەردگاردا ........ ٣٥
بەشی یەکەم: خۆناسی، کلیلی خواناسی ........ ٣٥
بەشی دووەم: پاکی و بێ‌خەوشی پەروەدگار ........ ٣٧
بەشێ سێیەم: ناسینی پادشایی کردنی پەروەردگار ........ ٣٨

**ناوەرۆک**


بەشی چوارەم: مەبەست لە ڕاڤەی بەراوردی نێوان پادشایەتی مرۆڤ و پادشایەتی پەروەردگار...... ٤١
بەشی شەشم: هۆی دژایەتی لە نێوان خەڵکدا................................................. ٤٣
بەشی حەوتم: ناسینی زیکرە چوارینەکان.................................................. ٤٤
بەشی هەشتەم: ڕێگای شەریعەت ڕێی بەختەوەرییە.......................................... ٤٥
بەشی نۆهەم: گومڕایی و نەزانی ئەهلی ئەباحەت........................................... ٤٦
سەردێری سێهەم: لە ناسینی دونیادا........................................................ ٥١
بەشی یەکەم: هۆی بوونی مرۆڤ لە دونیادا.................................................. ٥١
بەشی دووهەم: ڕاستەقینە و زیان و مەبەستی دونیا......................................... ٥٢
بەشی سێهەم: بنەمای دونیا- پێخور و بەرگ و خانوو........................................ ٥٣
بەشی چوارەم: چەن نموونەیەک لە سیحری دونیا و بێئاگایی هۆگرانی دونیا.................. ٥٤
بەشی پێنجەم: وا نییە کە هەرچی لە دونیا بێ دزێوە......................................... ٥٧
سەردێری چوارەم:لە ناسینی دوارۆژدا........................................................ ٥٩
بەشی یەکەم: بەهەشت و دۆژەهی جەستەیی و گیانی......................................... ٥٩
بەشی دووهەم: ڕاستەقینەی مردن............................................................ ٦٠
بەشی سێهەم: تۆیی تۆ بەم لەشە نییە........................................................ ٦٢
بەشی چوارەم: ڕاگرتنی هاوسەنگی ڕۆح....................................................... ٦٣
بەشی پێنجەم: واتای حەشر و نەشر و گەڕاندنەوە............................................ ٦٤
بەشی شەشەم: دیتنی بەهەشت و جەهەننەم لەم دونیایەدا.................................... ٦٥
بەشی حەوتەم: مانای عەزابی قەبر........................................................... ٦٧
بەشی هەشتەم: ڕاستەقینە و ڕادەکانی عەزاوی قەبر.......................................... ٦٨
بەشی نۆهەم: ئەوەی لەو جیهانیتر بێ، بە چاوی ئەم دونیایە نایەتە دیتن..................... ٧٠
بەشی دەیەم: عەزاوی گۆڕ بۆ چ کەسانێک هەیە و بۆ کێ نییە؟................................ ٧١
بەشی یازدەهەم: ڕێگای تاقیکردنەوەی بێوەی بوون لە ئازاری گۆڕ........................... ٧٢
بەشی دوازدەهەم: سێجۆری ئاوری دۆزەخی ڕۆحانی (گیانی)................................... ٧٣
بەشی سێزدە: ئاوری گیان گەلێک شەماڵەی زۆرترە لە ئاوری لەش............................. ٧٨
بەشی چواردەهەم: قۆناغەکانی سەیر و گەڕانی ڕۆح لە دونیا................................. ٧٩
بەشی پانزدەهەم: گومان لە ڕۆژی پەسڵان بە هیچ جۆر شیاو نییە............................. ٨٢
کتێبی یەکەم- لە عیبادەتدا..................................................................... ٨٦
بنەمای یەکەم - چوونە سەر بیر و ڕای ئەهلی سوننە........................................ ٨٧
دیتنەوەی بڕوای موسوڵمانی.................................................................... ٨٨
پەسن........................................................................................... ٨٨

دەسەلات ........ ٨٩
زانین ........ ٨٩
ویست و ئیرادە ........ ٨٩
چاو و گوێ ........ ٩٠
پەیڤ ........ ٩٠
کردەوەکان ........ ٩٠
پەسلان ........ ٩١
پێغەمبەر ........ ٩٢
بنەمای دووەم- لە کۆ کردنەوەی زانستدا ........ ٩٣
سەرنج: بڕ و بیانووی بێزانستی لە دیندا پارە ناکا! ........ ٩٥
سەرنج: هیچ کردەیەک بەرزتر لە فێربوونی زانست نییە ........ ٩٦
بنەمای سێهەم – باسی پاکی و تارەت ........ ٩٩
مەرجەکانی خۆپارازتن (احتیاط) کامن؟ ........ ١٠٠
جۆرەکانی خاوێنی و پاکی رواڵەت ........ ١٠٣
پاژی یەکەمپاکی لە سپڵۆت ........ ١٠٣
پاژی دووەم تارەت کردن ........ ١٠٥
پاژی سێهەم: پاقژ کردنەوە لە پیسایەکانی لەش ........ ١٠٩
بنەمای چوارەم- نوێژ ........ ١١٣
چونیەتی رواڵەتی نوێژ ........ ١١٤
شرۆڤەی راستەقینەو رووحی نوێژ ........ ١١٧
شرۆڤەی راستەقینەی رۆحی کردەکانی نوێژ ........ ١١٩
شرۆڤەی راستەقینەی زیکر و قورئان خوێندن لە نوێژدا ........ ١٢١
دەرمانی دڵ بۆ ئامادەبوون لە نوێژدا ........ ١٢٢
راڤەی نوێژی جەماعەت ........ ١٢٤
راڤەی خێری نوێژی هەینی ........ ١٢٦
مەرجەکانی نوێژ هەینی ........ ١٢٦
نەریتی نوێژی هەینی ........ ١٢٧
نەریتەکانی رۆژی هەینی ........ ١٢٩
پرسێک ........ ١٣١
بنەمای پێنجم - زەکات ........ ١٣٣
جۆرەکانی زەکات و مەرجەکانی ........ ١٣٣
جۆری دووهەم: زەکاتی دەیەکانە ........ ١٣٥
جۆری سێهەم: زێڕ و زیو ........ ١٣٥

**ناوەرۆک**


جۆری چوارەم: زەکاتی مامەڵە و بازرگانی ١٣٦
جۆری پێنجەم: زەکاتی جێژنی رەمەزان ١٣٦
چۆنییەتی زەکات دان ١٣٦
جۆری یەکەم ١٣٧
جۆری دووەم ١٣٧
جۆری سێهەم ١٣٧
جۆری چوارەم ١٣٧
جۆری پێنجەم: ١٣٧
راڤەی ئەم هەشت تاقمە ١٣٧
نهێنییەکانی زەکات دان ١٣٨
نهێنیی یەکەم ١٣٩
نهێنیی دووهەم ١٤٠
نهێنیی سێهەم ١٤٠
ئەریت و وردەکارییەکانی زەکات دان ١٤٠
ئەرکی یەکەم ١٤١
ئەرکی دووهەم ١٤١
ئەرکی سێهەم ١٤١
ئەرکی چوارەم ١٤٢
ئەرکی پێنجەم ١٤٢
ئەرکی شەشەم ١٤٣
ئەرکی حەوتەم ١٤٤
شێوەکانی دیتنەوەی هەژاران ١٤٤
ئەریتی وەرگری زەکات ١٤٥
خێر و ودمی سەدەقەدان ١٤٧
بنەمای شەشەم- رۆژوو و مەرجەکانی ١٤٩
فەرزەکانی رۆژوو ١٥٠
فەرزی یەکەم ١٥٠
فەرزی دووهەم ١٥٠
فەرزی سێهەم ١٥١
فەرزی چوارەم ١٥١
فەرزی پێنجەم ١٥١
فەرزی شەشەم ١٥١
سوننەتەکانی رۆژوو شەشن ١٥١

نهێنی و راستەقینەی ڕۆژوو ........................................ ١٥٢
حوکمەکانی ڕۆژووشکاندن ........................................ ١٥٤
بنەمای حەوتەم- حەج ........................................ ١٥٧
مەرجەکانی حەج کردن ........................................ ١٥٨
هێز دوو جۆرە: ........................................ ١٥٩
هیم و پێویستی و شێوازەکانی حەج بەجێهێنان و ئەو کارانەی کە نابێ لە حەجدا بکرێن .......... ١٥٩
چۆنییەتی حەج کردن ........................................ ١٦١
چۆنییەتی عومرە ........................................ ١٦٩
تەوافی مالاوایی ........................................ ١٦٩
سەردانی مەدینە ........................................ ١٧٠
نهێنیەکانی حەج ........................................ ١٧١
بنەمای هەشتەم – قورئان خوێندن ........................................ ١٧٥
قورئان خوێندنی لاپێیان ........................................ ١٧٥
نەریتەکانی قورئان خوێندن ........................................ ١٧٦
راستەقینەی یادی خوا ........................................ ١٨٤
هێژایی تەلیلەو تەسبیحات و شوکرانە و سەڵەوات و تکای لێبوردن ........................................ ١٨٦
نەریتەکانی دوعا ........................................ ١٨٩
دوعای ڕیکەوت ........................................ ١٩١
بنەمای دەهەم – ڕیزی ویردەکان ........................................ ١٩٥
لێکدانەوەی ویردەکانی ڕۆژ ........................................ ١٩٧
ویردی شەوانە کە ئەویش سێیە: ........................................ ٢٠٢
کتێبی دووهەم - لە کردەکاندا(معاملات) ........................................ ٢٠٤
بنەمای یەکەم - نەریتەکانی خۆراک خواردن ........................................ ٢٠٥
داب و دەستوری بەر لە خواردن ........................................ ٢٠٥
داب ودەستووری کاتی خواردن ........................................ ٢٠٦
داب و دەستووری ئاو خواردنەوە ........................................ ٢٠٧
دام ودەستووری پاش خواردن ........................................ ٢٠٨
دام و دەستووری خۆراک خواردن لە گەڵ کەسی‌تر ........................................ ٢٠٨
هێژایی نان خواردن لە گەڵ دۆستان و برایانی دینی ........................................ ٢١٠
دام و دەستووری خۆراک خواردن بۆ ئەو دۆستانەی سەردانی یەک دەکەن ........................................ ٢١٠
خێر و ودمی میوانداری ........................................ ٢١٢

## ناوەرۆک


نەریتەکانی بانگهێشتن و ڕۆیشتن بۆ داوەت ........ ٢١٢
نەریتی ئامادە بوون لە میوانی ........ ٢١٤
نەریتەکانی دانانی خواردن ........ ٢١٤
نەریتی هاتنەوە لە میوانی ........ ٢١٥
بنەمای دووەم - نەریتەکانی ژن هێنان ........ ٢١٧
بەشی یەکەم - قازانج و زیانەکانی نیکاح ........ ٢١٨
بەشی دووەم - چۆنیەتی مارەبڕین و نەریتەکانی و ئەودانستانەی ژن دەبێ هەیبێ ........ ٢٢٣
تایبەتمەندیەکانی ژن لە مارەبڕیندا ........ ٢٢٤
بەشی سێهەم - نەریتەکانی ژیان دەگەڵ ژنان لە سەرەتای مارەبڕینەوە تاکۆتایی ........ ٢٢٦
مافی مێرد بە سەر ژندا ........ ٢٣٤
بنەمای سێهەم- نەریتەکانی کار و بازرگانی ........ ٢٣٥
بەشی یەکەم- پەیڤین لەسەر خێر و ودمی مامەڵەی حەلال ........ ٢٣٥
بەشی دووەم باس لە زانستی کار و کەسب تا بە گوێرەی مەرجەکانی شەرع بێ ........ ٢٣٨
بەشی سێهەم - بە داد و ئینساف بوون لە مامەڵەدا ........ ٢٥٠
بەشی چوارەم- چاکەکاری لە مامەڵەدا ........ ٢٥٦
بەشی پێنجەم- بەزەیی هاتنەوەی بازرگان بەسەر دینی خۆیدا ........ ٢٥٩
بەشی یەکەم - خێر و ودمی کاری حەلال ........ ٢٦٥
بەشی دووهەم - ئاستەکانی حەلال و حەرام ........ ٢٦٧
بەشی سێهەم- تۆژینەوە بۆ لێککردنەوەی حەلال و حەرام ........ ٢٧١
بەشی چوارەم - وەرگرتنی مووچەی پادشایان و سلاو لێ کردنیان، ........ ٢٧٤
بنەمای پێنجەم - بەجێ هێنانی مافی پێوەندی دەگەڵ خەڵک ........ ٢٨٣
بەشی یەکەم - دۆستی و برادەریەک کە بۆ خودا بێ ........ ٢٨٣
بەشی دووەم - ئەرک و مەرجەکانی دۆستایەتی ........ ٢٩٠
ڕاڤەی ئەرکەکانی برادەری و دۆستایەتی ........ ٢٩٢
بەشی سێهەم - ئاخاوتن لەسەر ئەرکی موسوڵمانان، جیران وخزم و دەستوپێوەندان ........ ٣٠١
بنەمای شەشم - نەریتەکانی لە خەڵک دابڕان و کاژێر گرتن ........ ٣١٧
بەهرەکانی دوورەپەرێزی ........ ٣١٨
زیانەکانی دوورەپەرێزی ........ ٣٢٥
نەریتەکانی دوورەپەرێزی ........ ٣٣١
بنەمای حەوتم - نەریتەکانی سەفەر ........ ٣٣٣
بەشی یەکەم - مەبەست و نەریت و جۆرەکانی سەفەر ........ ٣٣٤

نەریتەکانی سەفەر: ........ ٣٣٨
بەشی دووەم - راڤەی ئەو زانستانەی کە مسافیر بەر لە سەفەر دەبێ فێر بێ ........ ٣٤١
بنەمای هەشتم - نەریتەکانی هەلەکەسەمای دەرویشان ........ ٣٤٥
کەواتە سەما سێ جۆرە: ........ ٣٤٦
بەشی دووهەم - ئاسەوار و تەریقەکانی سەما و گۆرانی ........ ٣٥٥
نەریتەکانی سەما ........ ٣٦١
بنەمای نۆهەم - فرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە ........ ٣٦٣
پاژی یەکەم - پێویست بوونی چاودێری ........ ٣٦٣
پاژی دووهەم - مەرجەکانی چاودێری ........ ٣٦٥
نەریتەکانی مۆچیاری کەر ........ ٣٧٦
بەشی سێهەم - ئەو خراپیانەی کە خەلک زۆریان خوو پێ کردووە ........ ٣٧٨
بنەمای دەهەم - حوکمڕانی و حوکمداری ........ ٣٨٣
دادوەری بە لەبەرچاو گرتنی ئەم دە بنەمایە پێک دێ: ........ ٣٨٥
کتێبی سێهەم — کوشندەکان (مهلکات) ........ ٣٩٧
بنەمای یەکەم - راهێنانی نەفس و پاکژ کردنەوەی لە خووی نزم ........ ٣٩٩
راڤەی هێژایی و چاکەی ئاکاری جوان ........ ٣٩٩
راستەقینەی ئاکاری بەرز ........ ٤٠١
راڤەی ئەمەی کەدەلوێ ئاکاری بەرز بەدەست بێنین ........ ٤٠٤
راڤەی رێی دەرمان ........ ٤٠٥
ئاکار بەرزبوون سێ هۆی هەیە: ........ ٤٠٦
لێکدانەوەو ناسینی نەخۆشییەکانی دڵ و کەمایەسییەکانی نەفس ........ ٤١٠
نیشانەکانی ساغی دڵ ........ ٤١١
مرۆڤ بە چوار جۆر دەتوانی نوقسانییەکانی خۆی بناسێ: ........ ٤١١
لێکدانەوەی نیشانەکانی ئاکاری جوان ........ ٤١٤
شرۆڤەی پەروەردەو راهێنانی منداڵان ........ ٤١٦
راڤەی مەرجەکانی موريد لە سەرەتای کۆشەوە و چۆنییەتی کۆشەوە لە رێ دیندا ........ ٤٢٠
پەردەکانی نێوان خودا و خەڵکی ........ ٤٢٠
رێنۆما ........ ٤٢١
بنەمای دووەم - لە کۆسپەکانی رێی دین، ئارەزووی سک و ژێر سکە ........ ٤٢٥
دەرمانی شاوەتی ورگ ........ ٤٢٥
شرۆڤەی هێژایی و پاداشی برسیەتی ........ ٤٢٥
شرۆڤەی قازانجەکانی برسیەتی و زیانی تێری ........ ٤٢٧

## ناوەرۆک


قازانجی یەکەم ..... ٤٢٧
قازانجی دووەم: ..... ٤٢٨
قازانجی سێهەم ..... ٤٢٨
قازانجی چوارەم ..... ٤٢٨
قازانجی پێنجەم ..... ٤٢٨
قازانجی شەشەم ..... ٤٢٩
قازانجی حەوتەم ..... ٤٢٩
قازانجی هەشتەم ..... ٤٣٠
قازانجی نۆهەم ..... ٤٣٠
قازانجی دەهەم ..... ٤٣٠
شرۆڤەی داب و نەریتی مورید لە کەم خواردنی خۆراک و لە کاتی خۆیدا خواردن ..... ٤٣٠
شرۆڤەی رازی ئەم کۆشەوانە و جیاوازی نێوان رای پیر و مورید لەم چەمکەدا ..... ٤٣٥
شرۆڤەی زیانەکانی واز هێنان لە ئارەزووەکانی نەفس ..... ٤٣٦
شاوەتی ژێر سک ..... ٤٣٦
شرۆڤەی شاوەتی ژێر سک ..... ٤٣٦
شرۆڤەی پاداشی ئەو کەسەی بە پێچەوانەی شاوەتی بجوێتەوە ..... ٤٣٨
شرۆڤەی زیانی سەیرکردنی ژنان و هۆی حەرام بوونی ..... ٤٤١
شرۆڤەی چاکەی بێدەنگی ..... ٤٤٤
ئافەتەکانی زمان ..... ٤٤٥
ئافەتی یەکەم ..... ٤٤٥
ئافەتی دووەم ..... ٤٤٧
ئافەتی سێهەم ..... ٤٤٧
ئافەتی چوارەم ..... ٤٤٨
ئافەتی پێنجەم ..... ٤٤٩
ئافەتی شەشەم ..... ٤٥٠
ئافەتی حەوتەم ..... ٤٥١
ئافەتی هەشتەم ..... ٤٥١
ئافەتی نۆهەم ..... ٤٥٤
ئافەتی دەهەم ..... ٤٥٥
ئافەتی یازدەهەم ..... ٤٥٥
ئافەتی دوازدەهەم ..... ٤٥٩
شرۆڤەی ئیزن بۆ خوسپە کردن ..... ٤٦٦
کەفارەی خوسپە ..... ٤٦٧

ئافەتی سیزدەهەم ........................................ ٤٦٨
ئافەتی چواردەهەم ........................................ ٤٧١
ئافەتی پانزدەهەم ........................................ ٤٧١
بنەمای چوارەم - باسی تووڕەیی و رک و قین و ئیرەیی و دەرمانی ئەوانە ........................ ٤٧٥
باسی تووڕەیی ........................................ ٤٧٥
هۆکانی تووڕە یی ........................................ ٤٧٩
رق وقین ........................................ ٤٨٣
ئیرەیی بردن ........................................ ٤٨٦
باس لە راستەقینەی ئیرەیی ........................................ ٤٨٨
شرۆڤەی دەرمانی ئیرەیی ........................................ ٤٨٩
بنەمای پێنجم- دەرمانی خۆشەویستی دونیا ........................................ ٤٩٣
شرۆڤەی ئافەتی دونیا ولۆمەی دونیا بە گوێرەی ئەخبار ........................................ ٤٩٤
ئاسار ........................................ ٤٩٧
شرۆڤەی راستەقینەی دونیای کرێت ........................................ ٥٠٠
بنەمای شەشم- دەرمانی رژدی وچاوچنۆکی بۆ کۆوە کردنی ماڵ وسامان ........................ ٥٠٥
شرۆڤە کرێت بوونی خۆشویستنی ماڵ وسامان ........................................ ٥٠٥
ئاسار ........................................ ٥٠٧
شرۆڤەی تێرو تەسەلی سوود و زیانەکانی ماڵ وسامان ........................................ ٥٠٩
ئافەتەکانی سامان ........................................ ٥١١
شرۆڤەی ئافەتی تەما و چنۆکی و قازانجی چاوتێری ........................................ ٥١٣
شرۆڤەی دەرمانکردنی تەما و چاونەزێری ........................................ ٥١٥
شرۆڤەی هێژایی و پاداشی دلاوایی ........................................ ٥١٧
ئاسار ........................................ ٥١٨
شرۆڤەی دزێو وخراپ بوونی رژدی وچرووکی ........................................ ٥٢٠
شرۆڤەی پاداشی لەخۆبوردن ........................................ ٥٢٢
راڤەی ئاستی دلاوایی و رژدی کە دلاوا کێیە و بەخیل کێیە ........................................ ٥٢٤
راڤەی دەرمانی رژدی ........................................ ٥٢٥
راڤەی ئەفسوونی ماڵوسامان ........................................ ٥٢٨
سیحری ماڵ پێنجن ........................................ ٥٢٨
بنەمای حەوتم - دەرمانی دۆستی و خۆشەویستی شانوشکۆی دونیا ........................ ٥٣٣
شرۆڤەی راستەقینەی شانوشکۆ ........................................ ٥٣٤
شرۆڤەی دەرمانی خۆشەویستی شانوشکۆ ........................................ ٥٣٩
شرۆڤەی دەرمانی حەز بە پێدا هەڵگوتن و پەسنی خەڵکی و ناحەزی بە لۆمەی خەڵکی ........... ٥٤٠

**ناوەرۆک**


حەز بە پەسن و پێدا هەڵگوتن چوار هۆی هەیە:........................ ٥٤١
شرۆڤەی جیاوازی ئاستی خەڵکی لە پەسن و رەخنەدا........................ ٥٤٣
بنەمای هەشتەم - دەرمانی دورازی بە عیبادەت و پەرستن........................ ٥٤٥
ئاسار........................ ٥٤٨
شرۆڤەی ئەو کارانەی رووبینی پێ دەکرێ........................ ٥٤٨
شرۆڤەی ئاستەکانی رووبینی........................ ٥٥١
شرۆڤەکردنی مەرایەک کە لە رۆیشتنی مێرووله بێدەنگترە........................ ٥٥٤
شرۆڤەی مەرایەک کە کردەوە پووچەڵ دەکا........................ ٥٥٦
شرۆڤە دەرمانی نەخۆشی رووبینی لە دڵدا........................ ٥٥٨
پێگەی یەکەم........................ ٥٥٨
پلەی دووەم........................ ٥٦٠
شرۆڤەی ئیزن بۆ ئاشکراکردنی عیبادەت........................ ٥٦٣
چیرۆک........................ ٥٦٥
شرۆڤەی ئیزنی شاردنەوەی گوناح........................ ٥٦٥
شرۆڤەی ئیزنی دەس راگرتن لە کاری چاکە لە ترسی رووبینی........................ ٥٦٦
بنەمای نۆهەم - دەرمانی لووتبەرزی و خۆبەزلزانی........................ ٥٧٣
هێژایی خۆبەکەمزانی........................ ٥٧٤
ئاسار........................ ٥٧٥
شرۆڤەی راستەقینەی خۆبەزلزانی و زیانەکانی........................ ٥٧٧
شرۆڤەی رادەکانی خۆبەزلزانی........................ ٥٧٨
شرۆڤەی هۆکارەکانی دەمارزلی و دەرمانەکانی........................ ٥٨٠
هۆکانی خۆ بە زلزانی........................ ٥٨٠
شرۆڤەی دەرمانی لووتبەرزی........................ ٥٨٦
ئاسەواری لووتبەرزی زۆرە:........................ ٥٨٨
شرۆڤەی لەخوبایی بوون (عجب) و زیانەکانی........................ ٥٩٣
راستەقینەی لە خۆبایی بوون و لووتبەرزی........................ ٥٩٤
شرۆڤەی دەرمانی لە خۆباییبوون........................ ٥٩٥
بنەمای دەهەم - باسی بێئاگایی و گومڕایی وخاپێنراوی........................ ٦٠١
شرۆڤەی دەرمانی بێ ئاگاری و نەزانی........................ ٦٠٢
شرۆڤەی گومڕایی و دەرمانەکانی........................ ٦٠٥
شرۆڤەی خۆ ویستی و دەرمانی........................ ٦٠٩

چینی مرۆڤە خۆویستەکان ........ ٦١٠
کتێبی چوارم- دەرباز کەرەکان (منجیات) ........ ٦٢٢
بنەمای یەکەم - پاشگەزبوونەوە لە گوناح یان تەوبە ........ ٦٢٣
هەڤیازی وپاداشی پاشگەزبوونەوە لە گوناح ........ ٦٢٣
راستەقینەی پاشگەزبوونەوە ........ ٦٢٥
شرۆڤەی ئەمەی کەپاشگەزبوونەوەلەهەرکاتدا بۆ هەموو کەس فەرزو پێویستە ........ ٦٢٦
شرۆڤەی قەبوول کردنی تەوبە ........ ٦٢٩
شرۆڤەی گوناحی بچووک و گەورە ........ ٦٣١
شرۆڤەی ئەو شتانەی گوناحگەلی بچووکی پێ زەلام دەبن ........ ٦٣٣
شرۆڤەی مەرجی تەوبەو دیاردەکانی ........ ٦٣٥
شرۆڤەی دەرمانی تەوبە کردن ........ ٦٣٩
بنەمای دووەم - پشوو درێژی و شوکرانەبژێری ........ ٦٤٣
راستەقینەی پشوودرێژی ........ ٦٤٤
شرۆڤەی ئەوەی کە بۆچی پشوودرێژی پاژێ لە بڕوایەو رۆژوو پاژێ لە پشوودرێژی ........ ٦٤٧
شرۆڤەی نیاز بە پشوودرێژی لە هەموو کاتدا ........ ٦٤٧
ئەو شتانەی کە هاودەنگی هەوای نەفسن ........ ٦٤٨
بەلام ئەو شتانەی بە ئاوەژووی ویستی نەفسن ........ ٦٤٨
شرۆڤەی دەرمانی پشوودرێژی ........ ٦٥٢
شرۆڤەی راستەقینە و هێژایی شوکرانەبژێری ........ ٦٥٣
راستەقینەی شوکرانەبژێری ........ ٦٥٥
شرۆڤەی ئەوەی کە کوفری هەر نیعمەتێ ئەوەیە کە ئەو نیعمەتە بە ئاوەژووی... ........ ٦٥٩
شرۆڤەی ئەوەی کەراستەقینەی نیعمەت کامەیە ........ ٦٦٤
شرۆڤەی سەرجەمی جۆرەکانی نیعمەت و ئاستەکانی ........ ٦٦٦
شرۆڤەی هۆی گوێنەدانی خەلکی بە شوکرانەبژێری ........ ٦٧١
بنەمای سێیەم - ترس و هیوا ........ ٦٧٥
هێژایی هیوا ........ ٦٧٥
راستەقینەی هیوا ........ ٦٧٧
دەرمانی هیوا بە دەستهێنان ........ ٦٧٩
ئەخبار ........ ٦٨٠
شرۆڤەی راستەقینە و هێژایی ترس و جۆرەکانی ........ ٦٨٤
ئاسار ........ ٦٨٦
راستەقینەی ترس ........ ٦٨٧

**ناوەڕۆک**


ئاستەکانی ترس ........ ٦٨٩

شرۆڤەی جۆرەکانی ترس لە خودا ........ ٦٨٩

شرۆڤەی ئاقیبەت شەڕی ........ ٦٩١

شرۆڤەی چۆنییەتی گەیشتن بە ترس لە خودا ........ ٦٩٣

چیرۆکی پێغەمبەران و فریشتەکان ........ ٦٩٥

سەربهووردی ئەسحاب و پێشوونان ........ ٦٩٦

بنەمای چوارم - هەژاری و پارێزکاری ........ ٧٠١

راستەقینەی هەژاری و پارێزکاری ........ ٧٠١

هێژایی هەژاری ........ ٧٠٣

هێژایی هەژاری و چاوتێری ........ ٧٠٥

داب و نەریتی هەژاری ........ ٧٠٩

نەریتی ئەستاندنی سەدەقە ........ ٧٠٩

شرۆڤەی ئەوەی کە دەرۆزەیی بەبێ نیاز حەرامە ........ ٧١٠

شرۆڤەی راستەقینە و هێژایی پارێزکاری ........ ٧١٣

هێژایی پارێزکاری ........ ٧١٥

شرۆڤەی ئاستەکانی پارێزکاری ........ ٧١٨

شرۆڤەی ئەو شتانەی کە پارێزکار دەبێ لە دونیادا قنیاتیان پێ بکا ........ ٧٢٠

بنەمای پێنجم - باس لە مەبەست و راستی و دلێشی و بێخەوشی ........ ٧٢٧

بەشی یەکەم - مەبەست ........ ٧٢٧

شرۆڤەی ئەو وازوازی و بیرەپیسانەی کەنابنە گوناح و... ........ ٧٣١

شرۆڤەی ئەو کردەوانە کە بە نیەت ئاڵ و وێر دەبن ........ ٧٣٤

شرۆڤەی ئەمەی کەنییەت بەویستی خۆ نییە ........ ٧٣٧

بەشی دووەم - باس لەهێژایی و راستەقینەو ئاستەکانی دلێشی ........ ٧٣٩

راستەقینەی دلێشی ........ ٧٤١

پاژی سێیەم - راستی ........ ٧٤٥

بنەمای شەشەم - چاودێری و بەخۆڕاگەیشتن ........ ٧٤٩

مەقامی یەکەم - مەرج دانان ........ ٧٥٠

مەقامی دووەم - چاودێری ........ ٧٥٢

مەقامی سێیەم - پێڕاگەیشتنی پاش کار ........ ٧٥٧

مەقامی چوارم - سزادانی نەفس ........ ٧٥٨

مەقامی پێنجم - تێکۆشانە ........ ٧٥٩

مەقامی شەشم - لۆمەو سەرزەنشتی نەفس ..... ٧٦١
بنەمای حەوتەم- بیر کردنەوە ..... ٧٦٥
هێژایی بیرکردنەوە ..... ٧٦٥
راستەقینەی بیرکردنەوە ..... ٧٦٦
راڤەی ئەوەی کەسەبارەت بە چی بیردەکرێتەوە ..... ٧٦٦
شرۆڤەی رێچکەی بیرکردنەوەکەلەچی دایەو بەرەو کوێ دەڕوا ..... ٧٦٧
هێڵی یەکەم ..... ٧٦٨
هێڵی دووەمی رامان، لە مەڕ خودایە ..... ٧٦٩
شرۆڤەی رامان لە دەسکردە سەیرەکانی پەروەردگاری مەزن ..... ٧٧١
بنەمای هەشتەم - تاکپەرستی و پشتبەستن ..... ٧٨٣
هێژایی پشتبەستن ..... ٧٨٣
راستەقینەی تاکپەرستی کە پشتبەستنی لەسەر بنیات نراوە ..... ٧٨٥
شرۆڤەی ئەو باوەڕەی کەبناغەی پشتبەستنی لەسەر دانراوە ..... ٧٩٣
شرۆڤەی راستەقینەی پشتبەستن ..... ٧٩٤
ئاستەکانی پشتبەستن ..... ٧٩٥
شرۆڤەی کارەکانی ئەو کەسەی پشتی بەخودا بەستووە ..... ٧٩٧
ئاستی یەکەم بەدەستهێنانی قازانج ..... ٧٩٧
ئاستی دووەم ..... ٧٩٩
ئاستی سێیەم ..... ٧٩٩
مەقامێکی تر لەپشتبەستندا راگرتن و هەماری سامانە ..... ٨٠٤
مەقامی سێیەم: ناسینی ئەو هۆکارانەیەکە بەرگری لەزیان و خەسار دەکەن ..... ٨٠٦
شێوازی هەڵس وکەوتی مرۆڤی پشتبەخوابەستوو کاتێ ماڵی دز بیبا ..... ٨٠٧
مەقامی چوارم- دەرمانی نەخۆشی و قەرەبووی ئەو زیانەی کە هاتۆتەدی ..... ٨٠٩
بنەمای نۆهەم - خۆشەویستی و تامەزرۆیی و رەزامەندی ..... ٨١٥
بایەخ و هێژایی دۆستایەتی پەروەردگاری مەزن ..... ٨١٥
راستەقینەی خۆشەویستی ..... ٨١٧
شرۆڤەی هۆکانی خۆشەویستی ..... ٨١٨
شرۆڤەی ئەوەی کە راستەقینەی چاکە چییە ..... ٨١٩
شرۆڤەی ئەوەی کە شیاوی دۆستایەتی راستەقینە، پەروەردگاری مەزن و بەس ..... ٨٢١
شرۆڤەی ئەمەی کەهیچ خۆشییەک وەکوو خۆشی دیداری پەروەردگار نییە ..... ٨٢٥
شرۆڤەی هۆی پیواربوونی ناسینی پەروەردگاری مەزن ..... ٨٣٥
شرۆڤەی چارەی خۆشەویستی ..... ٨٣٦

## ناوەرۆک


دیاردەکانی خۆشەویستی ........ ٨٣٩
شرۆڤەی واتای تامازرۆیی پەروەردگاری مەزن ........ ٨٤١
شروڤەی راستەقینەی رەزاو هێژاییەکانی ........ ٨٤٣
راستەقینەی رەزا ........ ٨٤٥
بنەمای دەیەم —بیر لە مردن کردنەوە ........ ٨٤٩
چۆنییەتی کاریگەربوونی بیری مردن لە دڵدا ........ ٨٥١
شرۆڤەی هێژایی ئاواتی کورت ........ ٨٥٢
شرۆڤەی هۆکانی درێژی ئاوات ........ ٨٥٣
خۆشەویستی دونیا ........ ٨٥٣
نەزانی ........ ٨٥٤
دەرمانی ئاواتی درێژ ........ ٨٥٤
ئاستەکانی ئاوات درێژی ........ ٨٥٤
شرۆڤەی ئاویلکە و ئێشی گیانکەندن ........ ٨٥٥
کارەستەکانی گیانەلا ........ ٨٥٧
شرۆڤەی ئاخافتنی قەبر دەگەڵ مردوو ........ ٨٥٩
پرسیاری مونکر و نەکیر ........ ٨٥٩
شرۆڤەی بارودۆخی مردووان کە لە ریی خەونەوە ئاشکرا بوون ........ ٨٦٢

## دەسپێک

سوپاس بۆ خودایەک کە بێ‌نیاز و بێ‌ئامبازە؛ خودایەک کە لە بەر بەزەیی خۆی هەموو بوونەوەرانی خولقاندن و ڕێی پێ نواندن تا بگەشێن و ببووژێن و پەرەبستێنن و بەرەو تەواوتر بوون بڕۆن. دونیا و هەرچی تێدایە لە تۆز و گاز ئافراند، ڕێگای کامڵ‌بوونی پێ نواند؛ لەو گازانە میلیۆنەها جۆری خولقاند، لە هەر جۆرە، هەزاران جۆری‌تری ڕسکاند. لە تاقە خانێک میلیۆنها جۆری ئافراند؛ یەکێکی لە ژێر بەحرا دانا، یەکێکی بەرەو ئاسمان فڕاند؛ یەکێکی لە ژێر خاک و یەکێ لە سەر خاک و یەکێکی لە سەر شاخ و هیتری لە بن هەردا دانا. گەرەکی[1] ژینی بۆ تەیار کردن؛ لە گچکە و گەورەی کەوی[2] کرد، سەری ڕیزی بۆ نەوی کەن. بێجگە لە مرۆڤ، کە وای ئافراند بێتە جێگر و بریکاری لە سەر خاک . ئەڵبەت نە بەو بۆنەوە کە سەری قاڵە و بە کار و باری دونیا ڕاناگا؛ نە. لە ڕاستیدا مرۆڤی وەک خۆی ئافراند، واتە لە گیانی خۆی فووی تێدا کرد، بۆ ئەوەی هەست بە گەورەیی کا، بەرەو گەورە بوون هەنگاو بنێ.

مرۆڤ دەزانێ، ئەم زەوینەی تێیدا دەژی لە خاکە، هەرچی تێیدایە هەر خاکە. لە دار و بەرد و ماسی و پەلەوەر و تەنانەت خودی مرۆڤیش لە خاکە و بۆ نێو خاک دەگەڕێنەوە؛ بناوانیان هەر لە خاکە. کەواتە، کە پاژێکی لە گیانی خوا بوو، ئەو پاژی‌تری لە خاک ڕسکاوە؛ بۆیە بە ئەنازەی هۆگری هەڵکشان و بەرز بوونەوەو گەشانەوە و فڕین بەرەو لای بینایی چاوان، حەزی بە مانەوە و گەڕانەوە و تێکەڵاوی دەگەڵ خاکە. خوا لێرەدا مرۆڤ و گیاندارانی‌تری لێک دابڕاند. گیاندارانی‌تر ناچار بە کڕنۆش بردن بۆ خودان؛ بەرنامەیەکیان بۆ نووسراوە کە ناتوانن بە موو لێی قوتار بن، لە فەرموودەی

---

١- گەرەک: پێداویستی.

٢- کەوی: ڕام.

پەروەرندەیان کلا[1] بن. بەڵام مرۆڤ: لە نێوان خواپەرستی و خۆڵ پەرستیدا دانراوە؛ لە سەر خاڵی سفر رسکاوە، لای راستی هەتاهەتای هەڵکشان و بەختەوەری(گیانی خوا)، لای چەپی هەتاهەتای کۆڵەواری و داکشان (قوڕی بۆگەن).

مرۆڤ لەم ناوەدا سێ چرای پێ دراوە تا تاریکی ئەم شەوگارەی –کە ناوی دونیایە و پڕ لە رازو نهێنییە– پێ بشکێنێ. ئەو سێیەش بریتین لە: زانین، تێگەیشتن و ویستن. بە هۆی ئەو شتانەوە کە دەیانبینێ و دەیانزانێ، دەتوانێ لە نهێنییەکان تێبگا. بۆ وێنە، مرۆڤە سەرەتاییەکان دەیانبینی کە باران دادەبارێ، دار و گیا شین دەبن، زەوی دەبووژێتەوە، ژیان دەگەڕێتەوە، بۆ خۆیشی لەو ئاوی بارانە دەخواتەوە؛ دەیدی کە گیاندارنیتریش لێی تێرئاو دەبن. هەندێ لەو گیا و روەکانە کە شین دەبن، بۆ خواردن دەشێن، پێگەیشت کە دەبێ ئەو دەخڵ و دانەی بۆ زستانان پێویستییە، خۆی بیچێنێ و ئاوی بۆ بێنێ؛ واتە خێ بداتە کشت و کاڵ. هەموو ئەمانەی بە گوێرەی ویست و ئیرادەی کرد؛ دەیتوانی نەیکا و وەکوو پێشوونان، بە راو و گۆشتی مەل و کەڵە کێوی بژی. بەڵام دڵی مرۆڤ دانامرکێ، هەڵوەدایە، هەردەم لە بیر شتی نوێدایە، حەزی لە گۆڕان و داهێنانە، حەزی لە ژیانی ئاسوودە و بێ کێشەیە، پێی خۆشە لە شتی باش بخوا، لە شوێنی باش بحاوێتەوە و ژیانی بەرەو باشتر بوون بروا. سەردەمێک وەکوو مەیموون لە سەر دار و لە نێو ئەشکەفتان دەژیا؛ دیارە کە وەکوو مەیموون دەژیا، ناچار بیچمیشی[2] وەکوو مەیموون بوو. پاش ئەوەی شتی نوێی داهێنا، خانووبەرەی نوێی چێ کرد، لە سەر داران دابەزی و لە ئەشکەفتانە هاتە دەر، بیچمیشی گۆڕا و راست و قنج رادەوەستا.

بەڵام، مرۆڤ ئەوەی کە دەیویست پێی گەیشت؟ مرۆڤ خوازیاری ئاسوودەیی، هێمنی و بەختەوەری بوو. بۆ دەرمانی نەخۆشییەکانی وەخۆ کەوت. لە سەرەتا پەنای بە سیحر و جادوو برد، ئەو شتانەی کە نەیدەناسین بە هۆی نەخۆشی و زیان و خەساری دەزانین. بەرە بەرە پەردە لە سەر نهێنییەکانی لادرا، شتی زۆری بۆ خویان بوون، پیوارەکان[3] ئاشکرا بوون. فڕۆکەو گەمیەی ناوەکی[4] و فەزاپێو و کۆمپیۆتەر و سەتەلایت و زۆر شتیتری چێ کرد. لە ناخی زەوی رۆچوو، پەردەی لە سەر نهێنییەکانی لادا، بەرەو ئاسمانان هەڵچوو، لە ئەستێرانی دەورو بەر خەریکی تۆژینەوەبوو؛ زەریا نەما گەو بەگەوی نەپێوێ، کێو نەما بست بە بستی نەگەڕێ؛ ئەو شتانەی پێشتر بە رازو نهێنی دەزاندران،

---

١- کلا: لەرێلادان.

٢- بیچم: تەرح و شکل.

٣- پیوار: نادیار.

٤- گەمیەی ناوەکی: کەشتی ناوکێش.

بۆی ئاشکرا بوون، بە چرای زانست هەمووی روون کردەوە و دێو و درنجی نێو دیرۆکانی[1] بەرەو نێو لاپەڕەکانی مێژوو راونا.

رەنگە بڵێین هەرچی ویستووە پێی گەیشتووە و تێگەیشتووە؛ بەڵام ئەوەی راستییە، وامان پێ ناڵێ. گەر مرۆڤ لە پەنای ئەو شتانەی ناسیویە و پێیان گەیشتووە، حەساوەتەوە، دەسا ئەم هەموو نائارامی و بێئۆقرەییەی هی چییە. راستە: مرۆڤ لە یەک شت دەترسێ، چونکە هەنووکە بۆی چار نەکراوە؛ ئەوەش مردنە.

راستی ، مرۆڤ بۆچی دەژی؟ بڵێی ژیان هەر ئەم حەوتا هەشتا ساڵە بێ و بەس؟ ئەم جێگا کە لە سەری راوەستاوین، ئەو شارستانییەتەی پێی گەیشتووین، ئەم تیکنۆلۆجیەی هەمانە، نووک و بەدی ئاکامی میلیاردەها ساڵ و بگرە زۆرتریش تەمەنی دونیایە. لەو دەمەیڕا کە دونیا بەهۆی تەقینەوەیەکی مەزنەوە هاتە دی و وردیلەکان ئاوێتە بوون، بوون بە گاز و بوون بە چی و چی... تا ئەوەی کە گەیشتۆتە ئێستا، پتر لە هەزاران میلیارد ساڵ کاتی بردووە؛ لە هەر خولێکدا مرۆڤی ئەو سەردەمە پێیان وابووە ژیان هەر ئەمەیە: لە سەردەمێکدا بە پێی ئەو فۆسیلانەی لە مووزەخانەی ئەورووپا و ئەمریکادان، نزیک بە ٢٠ تا ٤٠ ساڵ ژیاوە، ئێستا حەوتا و هەشتا و ئەوپەڕی سەدساڵ ژیان و پاشان مردن و ئیتر هیچ. گەر نەختێ سەرمان هەڵبڕین، لە دەورو پشتمان رامێنین، لە درێژایی مێژوو، لە پانتای دونیا، چ دەبینین: شارە مێرۆولەیەک کە هەزاران ساڵە دەنکە گەنمی زانین خڕ دەکەینەوە و لە سەر هەماری مێشکمانی کۆوە دەکەین. تەمەنی کورت، رۆژگاری درێژ. بەڵام ئەمانەی کۆی دەکەینەوە، کەی دەبێتە هی کێ؟ بڵێی پاش ئەوەی هەموومان مردین جارێکیتر دەژینەوە و لە هەموو دەسکەوتەکانمان کەلک وەردەگرین؟ بڵێی دەڕۆینە شوێنێک دەژین و ئەم دەسکەوتانەمان بۆ دەنێرن، تا بە ئارخەیانی ئەوەی ویستوومانە و نەمانبووە، بمانبێ و لە پەنایدا بحاوینەوە؟

پەروەردگارێ کە هەمووومانی لە نەبوونەوە ئافراند، کاتێ هەر نەبووین، خۆشمان ئاگەدار نەبووین کە نین، لە راستیدا خۆمانیش نەبووین کە بزانین هەین یا نین، هەر ئەو بوو و هیچیتر، ئێمەی ئافراند. خۆی دەیزانی چرای بیر و زەینمان کولە، لە راستیدا بە ئانقەست وای ئافراندووە، تا گەشە بکا و بەرەو کامڵ بوون بڕوا و لە رۆیین نەحەسێتەوە؛ سێ شتی پێ داین؟ زانین، تێگەیشتن و ویستن. خۆی دەیزانی کە ئەم سێیە بۆ بڕینی رێگای خەڵک تا خوا بڕ ناکا و کەل و ناتەواوە؛ بۆیە پێغەمبەرانی نارد کە وەڵامی ئەو پرسانەی بۆمان دێنە گۆڕێ و مێشک و ئاوەزمان لە بەرانبەریان چۆک دادەدەن، روون بکەنەوە. بە درێژایی تەمەنی مرۆڤ، ١٢٤ هەزار پێغەمبەر ناردرا. هەندێکیان تەنیا پێغەمبەری خۆیان بوون، هەندێ تەنیا هی بنەماڵەیەک، هەندێ هی شارێک، وڵاتێک، هەندێکیش هی هەموو مرۆڤێ

---

١- دیرۆک: چیرۆک.

## دەسپێک

بوون کە لەو کاتەدا لە سەر گۆی زەوی دەژیان و ئەوانەی کە لەوە دوا دەهاتن و دەژیان. ئەرکی هەر یەک لەم پێغەمبەرانە، تەواوترکردنی هەواڵ و پەیغامی پێغەمبەری پێشوو بووە؛ چونکە هەرکەسیان بە گوێرەی فام و زانین و تێگەیشتنی نەتەوەیەک ئاخاوتوون، ئیزنیان نەبووە شتێ بڵێن خەڵک فامی نەکەن. بەڵام سەرجەمی ئەم پێغەمبەرانە، مرۆڤیان بۆ سەفەرێک گاس[1] کردووە؛ ئەو سەفەرە جیا لە سەفەری نێوان ئەم شارو وڵاتانەیە. زادی رێگای لەگەڵ توێشووی سەفەری دونیا جیاوازە. ئەم سەفەرە، سەفەرێکە بەرەو ناخی خۆمان. پێمان دەڵێن نەختێ رامێنن، بەخۆتاندا بچنەوە، دونیایەکی بەرفراوان و پڕ لە هەورازو نەویتان بەرەڵا کردووە و ئاگاتان لێ بڕیوە. خەریکن لەم کۆنە هەوارەدا خانوو و کۆشکی بەرز و جوان چێ دەکەن، کەچی زستان لێرە نامێنن و خانووی سەرەکیتان کاول و خاپوور بووە و هیچ ئاوڕی لێ نادەنەوە. شەختەبەندی زستانتان لە پێشە و پێتان وایە وەرزی هاوین هەتاهەتایە بۆتان دەمێنێتەوە.

---

هەر پێغەمبەرێک کە هاتووە، توانیویە کەم یا زۆر بەرنامەیەک بۆ بەختەوەری ژیانی خەڵک بێنێ، خەڵکی سەردەم و دەوروبەری لە خەوی نەزانین راچڵەکێنێ. بەڵام پاش خۆی، ئاش هەمان ئاش و کاسە هەمان کاسە. تا ئەوەی کە دوایین پێغەمبەریش هاتووە و بەرنامەی گشتگیر و تەواوی خۆی راناوە. بیست و سێ ساڵ ژیانی خۆی بۆ رزگاری بەرەی مرۆڤ لە لارێ و هێنانەوەی بۆ سەر راستەرێ تەرخان کرد؛ بە ودمی هەناسەی، ژیانی خستە نێو دونیایەک کە خاکی مردووی بە سەردا پاشرابوو. ژیانی خستەوە نێو زیارەتانی دڵی مردووی خەڵک. بە هەناسەی مەسیحایی، تەم و خەمی دڵی پڕ لە کوڵی هەژارانی تاراند و بزەی هێنایەوە سەر زاری سێوی و نەداران. شا و گەدا لە بەرانبەری یەکسان بوون، رەش و سپی، عەرەب و عەجەم هاوشان بوون، تەنیا هۆی سەرتری هەر کەس کردەوەکانی بوو و بەس. ئامانجی کۆکردنەوەی مرۆڤ بوو لە ژێر یەک ئاڵای تاکپەرستیدا.

بەڵام پاش ئەو و یارانی، لە لایەکەوە حەفتا و دوو بۆچوونی جیاواز لە مەڕ دین سەری هەڵدا، هەرکەس تەنیا خۆی بە ڕەوا دەزانی. لە لایەکی‌ترەوە ئومەوی و عەباسی و فاتمیەکان، خۆیان کردە خاوەنی بەرنامەکانی. بەناوی دین، بەناوی خوا، میلەتانی ژێردەستیان دەچەوساندەوە؛ مافی خەڵکیان پێشێل دەکرد؛ خەلافەتیان کردە سەڵتەنەت و لە فەرموودەی خودا و پێغەمبەر کلا بوون. ئەمانە کاریان بە شەڕی حەفتا و دوو میللەتەوە نەبوو، کێ زۆرتر و بە زەبرتر با، لایەنگری ئەو بوون؛ ئەوانیش بە خەلیفەیاندا هەڵدەگوت، خەڵکیان لە جوبە و عابای شۆڕ و رمب و شمشێران دەترساند.

لەم ناوەدا کەڵە پیاوێ رابوو، هەرچی بتی داتاشراو بوو هەمووی شکاند. بانگی تاک پەرستی هەڵدا.

---

١- گاس: بانگ.

حەفتا و دوو میللەتی بە یەک دەزانی، دەیگوت هەمووتان یەکن، نیازتان یەکە، بەڵام جۆری ئاخافتنتان وەک یەک نییە. وەرن با بگەڕێینەوە سەر ڕێبازی ڕاستەقینەمان. بەم چەشنە ئیمام محەممەدی غەزالی سەفەرێکی لە ناخی خۆیدا دەس پێکرد. خەڵکی بەرەو ئەو سەفەرە گاس دەکرد و پەردەی لە سەر مەرایی و زوڵم و زۆر و دوڕازی[1] نابەکاران لادەدا.

ئەم کتێبە، واتە کیمیای بەختەوەری، هەمان سەفەری ئەو کەڵە پیاوەیە کە وەک دەڵێن کەس وەکوو ئەو بە سەر دونیای ئیسلامدا کاریگەری نەبووە. چ لە سەردمی خۆیدا و چ پاش خۆی ڕەخنەگر و دوژمن و دۆست و لایەنگری زۆر بووە، بەڵام هەموویان لە گەوەرەیی و شارەزایی ئەو پیاوەدا یەک دەنگ و ڕا بوون.

غەزالی پاش گەڕانەوەی لە سەفەری دوور و درێژی، لە زێدی خۆیدا خانەگایەک دادەمەزرێنێ و خەریکی ڕاهێنانی قوتابی و وانە گوتنەوە و خوێندنەوەی کتێبی مەزنی «ئەحیا» بۆ خەڵکوخوا دەبێ. هاووڵاتیانی -کە زمانیان فارسی بوو و لە عارەبی نەدەگەیشتن- داوایان کرد کە ئەو کتێبەیان بە فارسی بۆ بنووسێ با خەڵکی ڕەمەکیش تێیبگەن. غەزالی بۆ ئەم مەبەستە وەک خۆی لە «المنقذ»دا دەڵێ دەستی دا بە نووسینی کتێبێک بە ناوی «کیمیای سەعادەت»؛ واتە کیمیای بە ختەوەری.

ئەم کتێبە لە زمانی فارسیدا وەکوو «نثر پایه» -واتە نووسراوەی بناغە- چاوی لێ دەکرێ. دیارە ئەم نووسینە هی نزیک بە ۹۵۰ساڵی لەمەو پێشە و ئێستا زۆر لە خەڵکی فارس زمانیش تێیناگەن. بەڵام یەکێک لە جوانترین و ساکارترین نووسراوەکانی زمانی فارسییە. بێگومان هەرکەس فارسی ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە، هەست بە پوخت و پاراوی و جوانی و سادە و ساکاری و بێخەوشی و ڕاسبێژی و خۆشەویستی نووسەرەکەی دەکا. بە بڕوای من گیانی پیرۆزی ئەو کەڵە پیاوە لە نێو دێڕ بە دێڕ و وشە بە وشەی کتێبەکەیدا وەکوو ئاوێکی پاک و پاراو لە گەڕایە. بەش بە حاڵی خۆم نەمدیوە کەسێک ئەم کتێبەی خوێندبێتەوە و شەرم لە غەزالی نەیگرتبێ.

سەرەتا کە پێشنیاری وەرگێڕانی ئەم کتێبەم پێ کرا، لە خۆمڕا نەدەدی کە بتوانم وەریگێڕم؛ چونکە هەم باسی ئەم کتێبە باسی عیرفان و خواناسی و خۆناسی و دونیا و پەسڵان[2] ناسییە و بابەتی ورد و ناسکی زۆری تێدایە کە تێگەیشتنیان بۆ ئەوانەش کە شارەزا و لێزانی بەرهەمەکانی غەزالین دژوارە

---

۱- دوڕاز: دوڕو، ڕاست.

۲- پەسڵان: ڕۆژی قیامەت.

چ بگا بە من. دووەم زمانی کوردی بۆ بابەتی فەلسەفەی ئیسلامی و عیرفان و فیقهـ زۆر کرچ و کاڵە و کتێب و پەرتووکێک کە لەم بابەتانەدا بن و بە کوردی پەتی نووسرابێتن زۆر دەگمەنن. کەچی بە هەموو ئەمانەوە دەستم پێ کرد، گیر و گرفت و کێشەی زۆرم بۆ هاتە دی، بەڵام هەستم دەکرد کە گیانی ئەو پیاوە، دنەدەر[1] و ڕێشاندەرمە و هەرجار کە تووشی ناهومێدی دەبووم، وەکوو بلێی خۆی دەرروویەکی بۆ ئاوەڵا دەکردم و ڕاست و هەڵەم بۆ ڕوون دەبۆوە.

ڕەنگە ئێرە جێگەی ئەوە نەبێ تا باس لەو سەفەرە رۆحییە بکەم کە لەم ماوەیەدا بۆم هاتە دی؛ تەنیا ئەوە دەڵێم کە هەر دەم خواخوام بوو کە بەڵکوو ئەم کتێبە دوایی نەیێ و زۆر جار بە دۆستانمم دەگوت بریا تا دوایی ژینم هەر خەریکی وەرگێڕانی ئەم کتێبە بایەم و ئەم سەفەرەم دوایی نەهاتایە. وەکوو مەولانا دەڵێ:

خنک آن قماربازی که بباخت هرچه بودش　　　　بنماند هیچش الا هوس قمار دیگر

هەرچەن من ئەو قوماربازە نەبووم کە هەموو ژین و گیان و ماڵم لە ڕێی دلدارمدا بدۆڕێنم، بەڵام بریا ئەم ئەزموونەم جارێکیتر تاقی دەکردەوە. بریا کات لە و دەمانەدا ڕادەوەستا و ئەو چێژ و خۆشییە دوایی نەدەهات، بریا ژینم بەردەوام لە هەڵکشان و بەرزبوونەوەدا بایە و هەردەم چێژ و قومارێکیترم تاقی بکردایەتەوە. دیارە، خوزیا وبریا هیچ ناکا و مرۆڤ دەبێ خۆی پیاوانە بژیت و توخنی دونیا نەکەوێ و دڵی پێ نەسپێرێ و سەری بۆ نەوی نەکا.

خوێنەری هێژا! وەرگێڕ وەکوو باوەژن وایە: گەر چاکی وەربگێڕێ دەڵێن نووسراوەکە خۆی چاک بووە و گەر هەڵە و لارییەکی تێدا بێ، دەڵێن هی وەرگێڕە. بەڵام من خۆم دان بەوەدا دەنێم کە من تەنیا قامیشێک بووم کە فووی ئەو پیاوەم ڕاگواستەوە، گەر دەنگی خۆش بوو، ئەوە هەناسەی ئەوەو گەریش خراپ بوو ئەوەلار و وێڕی ئەم قامیشەیە. گەریش زۆر چاک بوو، دیسان چاکیەکەی بە ڕێژەی قامیشەکەیە، نەک شمشاڵ ژەنەکە:

دم که مرد نایی اندر نای کرد　　　　در خور نای است نه در خور مرد

بۆ ئەم وەرگێڕانە، ئەوەی لە توانامدا بوو، درێخیم نەکردووە، هەر ناتەواوییەکی هەیە، ئیدی ئەوە لە وزەی مندا نەبووە، هیوادارم کە دۆستان و زانایان ئاگەدارم کەنەوە و بمهێننەوە سەر هێڵی ڕاست.

بۆ وەرگێڕانی ئایەقورئانیەکان، زۆرتر لە پاچڤەکەی مامۆستای هێژا، هەژاری نەمر کەڵکم

---

١- دنەدەر: هاندەر.

وەرگرتووە. بەم بۆنەوە لە هەر شوێنێکدا کە نووسیبێتم «(هـ)» ئەوە مەبەستم هەژارە؛ گەریش هیچم نەنووسیبێ، ئەوە خۆم وەرمگێڕاوەتەوە. هەروەها وەرگێڕانی پەیڤە عارەبیەکانیش هەر کاری خۆمە و هەر رەخنەیەک کە بیبێت خۆم بەرپرسم نە کەسیتر.

لەم کارەدا زۆرکەس یارمەتییان دام، دیارە ناتوانم ناوی یەک بە یەکیان بێنم، بۆیە تەنیا ناوی ئەو بەڕێزانەی کە راستەوخۆ لە ئەنجامی ئەم پرۆژەیەدا بەشدار بوون بە گوێرەی تەمەن دێنم و سپاسیان دەکەم و بێگومان گەر ئەو خۆشەویستانە نەبایەن ئەم کارەم پێ نەدەکرا:

مامۆستای بەڕێزم کاک هادی مورادی کە بەردەوام لە چەندوچوونی کارەکە دەیپرسی و لە رێنومایيە بەنرخەکانی بێبەشی نەکردم.

دۆستی هێژام کاک رەئووفی مەلایی کە گەر متمانەی پێم نەکردایە و ئەرکی چاپی ئەم بەرهەمەی نەگرتایەتە ئەستۆ، رەنگە لەم بازارە پڕ لە گزی و دزییەدا کەس ئاوڕی لێ نەدایەتمەوە. لە خوا داوا دەکەم کە ژینی پڕپیت و خێر بێ و بەردەوام لە هەڵکشان و سەرکەوتندا بێ و قەد هەوری رەشی چارەڕەشی باڵی بە سەر ژینیدا نەکاتەوە.

خێزانی خۆشەویستم لەیلا جەهانی کە لەم ماوەیدا کەش و هەوایەکی ئاسوودەی بۆ پێک هێنام و لە کاتی نائۆمێدیدا هیوادەر و دنەدەرم هەر ئەو بوو و قەد بیانووی کەم و کووڕی ژینی پێ نەگرتم و جیا لەمانەش سەرجەمی ئەم کتێبەم بۆی خوێندەوە و پێکەوە لەگەڵ مەتنە فارسیەکەی و کتێبی «احیاء علوم الدین» بەراودمان کردو لە هەر شوێنێکدا ئاڵۆزی و ناتەواوییەک بوو، راستمان کردەوە.

دۆستی هێژام وریا دیوانی و خۆشکی خۆشەویستم سەیران پەرویزی و برای بەڕێزم کاک رەزا تورکی کە ئەم کتێبەیان بۆ تایپ کردم. دەست و چاویان خۆش بێ و سەرکەوتوو بن.

زۆر سپاسی ئەو دۆستانەی دەکەم کە دوور و نزیک هەواڵی ئەم کتێبەیان پرسیوە و دنەدەری ئەم کارەم بوون و تەنیا خۆشەویستی و هێژایی ئەوان بوو کە توانیم ئەم کارە دوایی پێ بێنم.

ئەمە ئێوە و ئەمەش بەرهەمی مەزنی ئیمام ئەبووحامیدی غەزالی، کیمای بەختەوەری.

**فەخرەدین ئامێدیان**

**سنە- پاییزی ١٣٨٨**

## ژیانی غەزالی

ئەبووحامید محەممەد کوڕی محەممەدی غەززالی تووسی لە ساڵی ٤٥٠ کـۆچی مـانگی (١٠٥٨ ز) لە باژێری تابەرانی تووسدا چاوی بە سەر دونیا کردەوە.

بابی ئەبووحامید پیاوێکی خواناس و پارێزکارو لە خواترس بـوو؛ سـۆفییەکـی راسـتەقینـە بـوو. زۆر زاهیدانە دەژیا و لە دونیا بێجگە لە کۆکردنەوەی توێشوویەک بۆ ژیانی دوارۆژی چیـدی نـەدەویـست. هێشتا منداڵەکانی واتە محەممەد و ئەحمـەد لـە خـەم نـەڕەسـتبوون، کـە بارگـەی بـەرەو جیهـانی هەرەمانەوە لێک ناو ماڵاوایی لە دونیا کرد و رووی لە جیهانی خامۆشان نا. بابی غەزالی بەر لە مـردنی قەوینتی[1] بۆ یەکێک لە دۆستەکانی -کە ئەویش سۆفییەکی دڵ پاک بـوو- کـرد کـە سـەرپـەرشـتی سێویە[2]کانی بگرێتە ئەستۆ و چاودێرییان لێ بکـا و بییاننێتـە بـەر خوێنـدن و بـۆ ئـەم مـەبـەسـتەش میراتییەکی بۆ بەجێهێشتن. پاش ماوەیەک میراتەکەیان دوایی هات و دۆسـتەکـەی بابیـان کـە بـۆ خۆی پیاوێکی هیچ نەدار و بەلەنگاز[3] بوو، پێی نەدەکرا ژیانی ئەو دوو منداڵە دابین کا، بۆیـە دڵـسۆزانە پێیڕاسپاردن کە بڕۆنە حوجرەی یەکێک لە مزگەوتەکانی ئەو سەردەمـە و بپـەرژێنـە سـەر خوێنـدن. ئەم پەیڤەی غەزالی کە دەڵێ بە بۆنەی بێجگە لە خـوداوە خـەریکـی فێربـوونی زانـست بـووم، بـەڵام زانست بێجگە لە خودا وەرناگرێ، بەڵگەیەکە بۆ ئەم راستییە.

ساڵی ٤٦٣ ک.م رۆیشتە نێو قوتابخانەوە. بۆ خۆی لە نامەیەکدا بۆ پادشای سەلجووقی دەنووسێ:

پەنجا و سێ ساڵ لە تەمەنم رابردووەو ماوەی چل ساڵە لـە نێـو زەریـای زانـستدا خـەریکـی مەلەم. بە چەشنێ کە پەیڤ و قسەم لە رادەی تێگەیشتنی زۆربەی خەڵکی ئەم دونیایە تێپـەڕا. بیست ساڵ لە تەمەنم لە رۆژگاری سوڵتانی شەهید (مەلەکشا)دا ژیام و لە سۆنگەی ئـەوەوە لـە

---

١- قەوینت: راسپێری.

٢- سێویە: منالی دای و باب مردوو.

٣- بەلەنگاز: بێچارە.

ئیسفەهان و بەغدادا ڕێزی زۆریان گرتم. چەن جاریش وەکوو ناوبژیکەر لە نێوان سوڵتان و خەلیفەدا هاتو چۆم کرد بۆ پێک هێنانی کاری گەورە و گرینگ[1].

پاش دامەزرانی لە قوتابخانە و لە کۆڵ کەوتنی خەمی نان، پەرژایە سەر خوێندن و ڕاهێنانی خۆی و بە وردی گوێی بۆ مامۆستایانی ڕاگرت تا ئەوەی لە زانستی فیقهدا وای لێ هات کە لە ڕیزی چاکترین شاگردەکانی ئەحمەدی کوڕی ڕادکانیدا جێی گرت.

یەکەمین خولی خوێندنی لە تووسدا پێنج سالی خایاند. پاش ئەوە رووی لە شاری گورگان نا تا لە پەرای[2] مامۆستای دووهەمیدا ئەبولقاسمی ئیسماعیلی جورجانی، کەڵک وەربگرێ. غەزالی دەڵێ:

پاش گەڕانەوە لە گورگان، لە ڕێدا تووشی جەردە هاتین. هەرچی لەو کاروانەدا هەبوو هەموویان بە تالان برد. لەو ماوەیەدا کە خەریکی خوێندن بووم، نامیلکەو دەسنووسی زۆرم کۆ کردبووەوە، هەمووی لە نێو بارەکەمدا بوو. جەردەکان ئەوەشیان بە تالان برد. کەوتمە دوویان و زۆرم تکا لێ کردن کە پێمی بدەنەوە. سەرۆکی ڕێگرەکان گوتی ئەگەر ناتەوێ گیانیشت بدۆڕێنی، زوو بگەڕێوە. منیش گوتم تکاتان لێ دەکەم ئەنجامی چەن ساڵ سەفەر و خوێندنم ئەوەتە لە نێو ئەو هەمانەیە، پێمی بدەنەوە؛ چونکوو هەم بە کەڵکی ئێوە نایێ و هەمیش ژیانی من بە خەسار دەڕوا. سەرۆکی جەردەکان پێکەنی و گوتی: چۆن خۆت بە زانا دەزانی، لە کاتێکدا هەموو زانستەکەت بە تالان براوە، گوتی بە هاوڕێیەکانی کە پێمی بدەنەوە.

ئەم ڕێگرە ڕێنوما و ڕێشاندەرێ بوو کە پەروەرندەم لە سەر ڕێگامدا داینا تا مۆچیاریم کا و پەندی ژیرانەم بداتێ. کە گەڕامەوە زێدی خۆم، سێ سالی ڕەبەق خەریکی لە بەر کردن و خوێندن و تێگەیشتنی نامیلکە و نووسراوەکانم بوو؛ تا ئەم جار کە تووشی ڕێگران بووم، زانستەکەم نەفەوتێ.

پاش لە بەرکردنی نووسراوەکانی، ڕێگای نەیشابووری گرتە بەر تا لە خزمەت زاناو موتەکەلیمی بەناوبانگ، ئیمامولحەرەمەیندا چێژ وەربگرێ و زانستی کەلام فێر بێ. پاش دوو ساڵ، غەزالی بوو بە سەرگوڵی نێو شاگردەکانی ئیمامولحەرەمەین، بە چەشنێ کە لە هەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا بە شاگردێکی وەکوو غەزالی شانازی دەکرد.

ساڵی ٤٧٨ کۆچی کە چرای ژیانی ئیمامولحەرەمەین کوژایەوە، غەزالی ببووە مامۆستایەکی تەواو و لە نێو زانایانی ئەو دەڤەرەدا ناوبانگێکی بەرزی پێکەوە نابوو. پاش ئاوابوونی هەتاوی ژینی مامۆستای،

---

١ - غەزالی: «مکاتیب فارسی»، ئامادەکردنی عەبباس ئیقبالی ئاشتیانی، ل٤.

٢- پەرا= خزمەت.

مامۆستایەکی‌تر -کە شیاوی مامۆستایی بێ- لەو ناوچەیەدا نەبوو، بۆیە بۆ خۆی پەرژایە سەر خوێندن و توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو لە زۆربەی زانستەکانی ئەو سەردەمەدا ببووە مامۆستایەکی لێهاتوو و شارەزا.

سالی ٤٧٨ کۆچی غەزالی ڕێگای گەیشتە نێو لەشکربەزی سولتان مەلەکشای سەلجووقی و لەگەڵ وەزیری هەلکەوتەو لێهاتوو و شارەزاو ژیرو زۆرزانی ئەو سولتانە، واتە خواجە نیزامولمولکی تووسیدا ئاشنا بوو. لە لای ئەم وەزیرە شافیعیەدا چەنای چەن جار لەگەڵ زانایانی‌تردا کەوتنە شەڕە قسە و هەرجار بە سەریاندا زاڵ دەبوو و پلە و ئاستی شارەزایی خۆی زۆرتر بەرز دەکردەوە، بە چەشنێ کە نازناوی «زەینودین»ی پێ درا و لە سەر داوای نیزامولمولک بوو بە مامۆستای نیزامییەی بەغدا.

سالی ٤٨٤ غەزالی لە تووسەوە بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ. خەڵکێکی زۆروزەوەند بۆ پێشوازی لە غەزالی ئاپۆرەیان بەستبوو. پاش ماوەیەکی کەم، ناوبانگی غەزالی بە نێو هەموو شاردا بڵاو بووەوەو باس لە زانست و ئاخاوتن و شارەزایی غەزالی لە نێو هەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا لە سەر زاری خەڵکی نەدەبڕا. ئەو مسافیرانەی کە بە بەغدادا تێدەپەڕان، باسی هەڵکەوتوویی و لێهاتوویی و شارەزایی غەزالیان بە شاراندا بڵاو دەکردەوە. تەنانەت زۆربەی دەسەڵاتداران بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتیان دەسەوداوێنی غەزالی دەبوون.

لە بەغدا نازناوی «حوججەتولئیسلام»ی پێ دراو لە کاتی نیشتنە سەر تەختی «المستظهر باللە» بیست و هەشتمین خەلیفەی عەبباسیدا بەشدار بوو و لە گەڵی پەیمانی بەست. لە نامەیەکدا لە پەرسڤ[1] وەرگەڕاندنی نیزامودین ئەحمەددا پاش دەربڕینی شەرمەساری و پەژیوانی لە ژیانی شاهانەی رابردووی، دەنووسێ: «لە بەغدا، ناچاری لە شەڕەقسە و خزمەتی سولتان»[2].

غەزالی لەم ماوەیەدا خەریکی خوێندن و لێکۆڵینەوە لە سەر بابەتی جۆراوجۆر بوو. بەردەوام خەریکی بیرکردنەوە و وردبوونەوەو وەرددانەوەی زانستەکانی بوو. ڕۆحی بزۆز و نائارامی لە هیچ کوێڕا ئۆقرەی نەدەگرت. ڕۆحی سەرکەشی تەنیا بە دیتنەوەی راستەقینەدادەمرکا. لەو ماوەیەدا کە لە بەغدا بوو، بە وردی لە بیروڕا فەلسەفییەکاندا ورد بووەوەو بە تەواوی بە سەر فەلسەفەدا زاڵ بوو و هەموو کونج و قوژبنەکانی لێکدایەوەو بۆ ئەم مەبەستەش، واتە بۆ پیشاندانی شارەزایی خۆی لە سەر فەلسەفە، کتێبێکی نووسی بە ناوی «مقاصد الفلاسفه». لەم کتێبەیدا بیرو راو بۆچوونەکانی فارابی و

---

١- پەرسڤ: جواب، وەرام.

٢ - غەزالی: «مکاتیب فارسی»، ئامادەکردنی عەبباس ئیقبال، ل٤٥.

ئەبوو عەلی سینای بە وردی لێک دایەوەو کونج و قوژبنەکانی پشکنی و خستنیە روو. پاشان بۆ رەت کردنـەوەو پووچـەڵ کردنـەوەی ئـەو بـیرو بۆچوونـە هزریانـە، کتێبێکـی نووسـی بـە نـاوی «تهافـت الفلاسفه».

ساڵی ٤٨٨ واتە پاش چوار ساڵ دەرس وتنەوەلە نیزامیەی بەغـدا، غـەزالی ناوبـانگێکی وای پێکـەوە نابوو، کە لە نێو کۆڕی زانایاندا دوایین قسە، قسەی ئەو بوو. بەلام غەزالی هەموو ئەو زانستانەی کـە لـە ماوەی سیو هەشت ساڵی تەمەنیدا کۆی کردبۆوە، بە نەزۆکی دەزانین. هیچ یـەک لـەو زانـستانە لـە فیقەو کەلام و شەڕەقسە(جدل) و فەلسەفە، ڕێیان نە دەبردە مەنزلگای بەختەوەری. بـە جۆرێـک کـە دەڵێن، غەزالی لەم ماوەیەدا چەن ئەزموونێکی دەروونی بۆ هاتە ئاراوە و بوو بە هۆی ئەوەی کـە رەوتی ئاسایی ژیانی تێک بچێ و تووشی ئاڵۆزی دەروونی بێ و نزیـک بـە شـەش مانـگ لـە مـاڵ نـەهاتـە دەرەوە. تا ئەوەی بە یەکجاری بڕیاری خـۆی دا و چـشی لـە مالـی دونیـا و پلـە و پاگـەی زانـستی و قوتابخانە کرد و بۆ دیتنەوەی راستەقینەی ڕێگایەکی نوێی گرتە بەر.

بەر لەوەی لە سەر چییەتی ئەم رێگا نوێیـەی غـەزالی بـدوین، چـاتر وایـە ئاوڕێـک لـە هـۆی ئـەم تێکچوونە بدەینەوە. غەزالی دەڵێ:

> پاش ئەوەی لە فێربوونی زانستی جۆراوجۆر بوومەوەو بوومە هەڵکەوتـەی زەمـانی خـۆم، رووم لە ڕێبازی سۆفییە نا و تێگەیشتم کە سەرکەوتن و گەیشتن لە قوولایی بابەتەکانی ئـەم ڕێبـازە، بە دوو چەشنە: زانین و کردەوە. بۆ من فێر بـوونی زانـست لـە کـردەوە سـاناتر بـوو. بۆیـە ئـەو کتێبانەی کە بۆ راڤەی ئەم زانستە بوون، هەمووم سەروبـن کـردو نـووکـو بـەدیـانم خوێنـدەوە؛ وەکوو کتێبی «قوت القلوب»ی ئەبووتالبی مەککی، کتێبەکانی حارسی مەحاسبی و ئەو بـاس و سەربهوردانەی لە مەڕ جونەید و بایەزیـدی بـەسـتامی و کـەسـانیتـرم بـە وردی خوێنـدەوە و لێکمدانەوە و وەردم دانەوە و لە کاکڵەی مەبەستیان گەیشتم. بەلام راستییەکەی ئەوەیـە تـا بـە کردەوە ئەم ڕێگایە نەبڕی، هیچی لێ ناگەی. ڕێگای تەسەووف، ڕێگای حاڵە؛ دەبـێ بـە گـۆڕانی بارودۆخت لێی بگەی نەک بە پەیڤ و ئاخاوتن[1].

پاش ئەمانە دەستی لە کاری دەرز وتنەوە هـەڵـگرت و ڕێگـای تـەسـەووفی گرتـە بـەر. بـەلام لـە لایێکەوە شاوەتی گراوی و خۆشەویستی ماڵوسامان و پلە و پاگـەی دونیـایی و لـە لایێکـەوە دەنگـی ئیمان و بڕوا خستبوویانە نێو تەنگەبەرەوە و باری دەروونیان ئاڵۆز کردبوو. شـەش مـانگی رەبـەق لـەم دۆخەدا بوو. غەزالی دەڵێ:

> لەم چەن مانگەدا دەسەلاتم بە سەر بارودۆخی خۆمەوە نەما. پـەروەرنـدەم قفـلێکی بـە سـەر

---

١ - غەزالی «المنقذ من الضلال».

زارمدا نابوو، بە چەشنێ کە خوستی[1] دەرز وتنەوەم لێ بڕابوو. زمانم بۆ گوتنی تەنیا وشەیەکیش نەدەگەڕا. بەرەبەرە ئەم قفلەی سەرزارم، بوو بە خەم و کەسەرێکی ئێجگار مەزن کە بە سەر دڵمدا چەمەرەی دابوو؛ وام لێ هاتبوو کە تەنانەت نانم پێ نەدەخورا و هیچ چێژێکم لە خواردن و خواردنەوە نەدەبرد. ئەم خەمە وای لێکردم کە هیچ هێز و ورەیەکم پێ نەمابوو؛ لە گیانی خۆم وەڕەز ببووم. پزیشکان لە دەرمانم شەرمەزار بوون، دەیانگوت هۆی ئەم دەردە، خەمێکی گەورەیە کە چەتری بە سەر دڵیدا کێشاوەو هیچ دەرمان بێجگە لە سڕینەوەی ئەو خەمە نییە.

ئێجگار لاواز و بێهێز و خوست بووم. وەکوو داماوانی بێدەرەتان، هانام بردە بەر پەروەرندەم. پەروەرندەم وەرامی دامەوەو دابڕان لە ماڵ و ژن و منداڵی لە لا سانا کردم. گوتم دەڕۆم بۆ حەج، بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستم ڕۆیین بۆ شام بوو.

ساڵی ٤٨٨ ڕووی لە شام نا. ماوەی دوو ساڵان لەوێ مایەوەو بێجگە لە چاودێری و عیبادەت و دوورەپەرێزی هیچیتری نەدەکرد. ماوەیەک لە مزگەوتێکی دەمشقڕا بوو. هەموو ڕۆژێ دەڕۆیشتە سەر منارەو لە سووچێکدا خەریکی عیبادەت و بیرو یادی پەروەردگار دەبوو. دەڵێن ڕۆژێ کابرایەک لە مامۆستایەک پرسیارێکی کرد. بە تەواوی پەرسڤیان نەدایەوە. ئەمیش بانگی ئەو کابرایە دەکا و بە وردی وەرامی دەداتەوە. قوتابیان و مامۆستانیتر گوێیان لێ دەبێ و لە وەڵامە وردو تەکووزە[2] کە لەکابرایەکی نامۆ و بیانی و کەسنەناس دەبیسن، سەریان سووڕ دەمێنێ. بۆیە تکای لێ دەکەن کە ببێتە مامۆستایان. غەزالی لە ترسی تووش هاتن بە عوجب و خۆ ویسی لەوێش باردەکاو ڕوو لە بەیتولموقەددەس دەنێ و ماوەی چەن ساڵیش لەوێ دەمێنێتەوەو خەریکی چاودێری و عیبادەت و بیرکردنەوەو ڕامان دەبێ، تا ئەوەی کە پاپای[3] حەجی دەکەوێتە دڵ و دەڕوا بۆ حیجاز.

پاش حەج کردن، تامازرۆی دیتنی زێد و منداڵی دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ تووس. کە دەگەڕێتە وڵاتی خۆی، لەوێش لە کونجێکدا ژیانێکی زاهیدانە دەست پێ دەکاو دڵی لە هەرچی گراوی دونیایە پاڵفتە دەکا. بەڵام ڕووداوەکانی ژیان و دابینکردنی بژیوی ژن و منداڵ، وازی لێ ناهێنن و جار بە جار کونجی تەنیایی لێ تێک دەدەن.

ئەم ماوە دەساڵی خایاند و لەم دە ساڵەدا غەزالی گرینگترین کتێبی خۆی، واتە «احیاءالعلوم الدین»ی نووسی.ساڵی ٤٩٩ ک.م لە کونجی تەنیایی هاتە دەر و ڕووی لە نەیشابوور نا و لەوێ بۆ

---

١- خوست: جووڵە، بزوتن، هەست.

-٢ تەکووز: ڕێک و پێک.

٣- پاپا: زۆر بەتاسە.

ماوەی دوو ساڵ لە نیزامییەی نەیشابوور خەریکی دەرزوتنەوە بوو. هۆی ئەم سەفەرەی بۆ نیزامییەی نەیشابوور، چاوڕاوی پادشا بوو کە دەیگوت دەبێ لەم نیزامییەدا دەرز بڵێتەوەو غەزالی ناچار لەم سەفەرە بوو.

پاش دوو ساڵ دەرزوتنەوەو مردنی پادشا، نیزامییەی بەجێ هێشتو گەڕایەوە تووس و لەوێدا لە خانەقایەکدا قوتابخانەیەکی دامەزراند و خەریکی دەرزوتنەوە بوو. پاش سێ ساڵ دەرزوتنەوە لەساڵی ٥٠٥ کۆچیدا بەرانبەر لەگەڵ ١١١١ زایینی، لە تەمەنی ٥٥ ساڵیدا و لە شاری تووسدا بنەو بارگەی بەرەو جیهانی هەرەمانەوە لێک ناو بە دیداری پەروەرندەی شادوشوکر بوو.

## نووسراوەکانی

لە نێو نووسەران و زانایانی ئیسلامیدا کەمتر نووسەرو زانایەک وەکوو غەزالی نووسراوەو کتێبی هەیە؛ بە چەشنێ کە دەڵێن، گەر ژمارەی نووسراوەکانی بە سەر رۆژەکانی تەمەنیدا دابەش کەی، هەر رۆژ چوار نامیلکەی بەردەکەوێ. خویانە کە ئەمە راست نییە و زۆربەی ئەم نووسراوانە هی کەسانی‌ترن. بەلام ئەو نووسراوانەی کە هی غەزالین، ئێجگار زۆرن. بابەتی نووسراوەکانی بریتین لە: فیقە، کەلام، فەلسەفە، عیرفان و تەسەووف، ئاکار، ئۆتۆبیۆگرافی، مەنتیق و ... .

لە خوارەوە ئاماژە بە هەندێ لە نووسراوەکانی دەکرێ:

- البسیط، الوسیط، الوجیز؛
- مقاصد الفلاسفه، لە ساڵی ٤٨٧ دا نووسراوە؛
- تهافت الفلاسفه، محک النظر، معیارالعلم، میزان العمل، المستظهری، حجه الحق؛ لە ساڵی ٤٨٨ دا نووسراوە.
- الاقتصاد فی الاعتقاد، قواعد العقائد، الرساله القدسیه، لە ساڵی ٤٨٩ نووسراوە.
- ساڵانی ٤٩٠-٤٩٥ لە شام و قودس و حیجازدا «احیاءعلوم دین»ی نووسیوە.
- بدایه الهدایه، ساڵی ٤٩٥؛
- ساڵانی ٤٩٥-٤٩٨ جواهر القورآن، کتاب‌الاربعین، کیمیای سعادث، الدره الفاخرەی نووسیوە؛
- القسطاس المستقیم، فیصل التفرقه بین الاسلام و الزندقه، ساڵی ٤٩٧؛
- ایهاالولد، المنقذ من الضلال، ساڵی ٥٠٠ ؛
- المستصفی من اصول الفقه، ساڵی ٥٠٣؛
- مشکاة الانوار، ساڵی ٥٠٣-٥٠٥ ؛

- الجام العوام من علم الكلام، معراج السالكين، سالی ٤٠٤-٤٠٥.

بێجگە لەمانەی ئاماژەیان پێکرا، خێوی بەرهەم و پەرتووکی بەنرخی‌تره کە لێرەدا ناومان نەبردن.

## ژیانی هزری و دەروونی غەزالی

یەکەم شتێک کە لە ژیانی غەزالیدا سەرنجی هەر خوێنەرێ بەرەو لای خۆی رادەکێشێ خولیای زانین و تێگەیشتن لە بنج و بناوانی هەموو ئەو زانستانەیە کە روویان لێ دەکا؛ تاسە و تامەزرۆییەکی بێ‌بن و بێ‌برانەوە کە لە ناخی غەزالیدا بەرەو فێر بوون هانی دەدا؛ پاپایەک کە تا دەژی لە گەڵیایەو تەنیا بە مردن لێی دەبێتەوە. لە کتێبی «المنقذ من الضلال»دا دەڵێ:

> لە هەرەتی لاوەتیمەوە کە تەمەنم نەگەیبووە بیست، تا ئێستا کە لە پەنجا تێپەڕاوم، لە بنج و بناوانی زانستەکان کۆڵاومەتەوەو لە نێو ئەم زێیە بێ بنەدا رۆچووم و وردبوومەتەوە... لە هەر لێڵییەکدا روون بوومەوە، بە سەر هەر کۆسپێکدا هەڵزنام، هەموو هەورازێکم بڕی و لە سەر هەموو بڕوایەک تۆژامەوە، لە هەموو گێژاوێ بازم دا تا لێیان شارەزا بم؛ تا بتوانم راست و هەڵە، چاک و خراپ لێک کەمەوە، لە هیچ باتنیەک بازم نەدەدا تا بە وردی لە ناخی نەدەگەیشتم، لە بنج و بناوانی هەموو زانستێک دەکۆڵامەوە تا بە وردی لێی دەگەیشتم و راستی رێگام لێ خویان دەبوو.

ئەوەی خودانی ئاوەها دانستەیەک بێ، دەبێ بە چاوی رەخنەگرانەوە سەیری هەموو شتێ کا؛ چونکە گیانی رەخنەگری بۆتە بەشێ لە بوونی، لە ژیانی. غەزالی‌لەم راستییەشارەزا بوو کە زۆربەی بیروبڕواکانی مرۆڤ بە میراتی لە باب و کالیەوە پێی دەگەن؛ چونکە مندالانی مووسایی، مووسایی دێنە دونیاو مندالانی عیسایی، عیسایی و مندالانی موسوڵمان، موسوڵمان.

سەرنجی بەم راستیەش دەدا کە فیترەتی سەرەکی مرۆڤ، لە هەر چاولێ‌بڕین و تەقلیدێک بە دوورەو بێجگە لە راستەقینە، هۆگری هیچ شتەکی‌تر نییە. واتە، چاوبڕین لەو شتانەی کە مرۆڤ لە دایک و باب و مامۆستای فێر دەبێ‌و بە بێ تاقی‌کردنەوەیان دانیان پێدا دەنێ و دەیسەلمێنێ. بەڵام ئەوانەی هۆگری زانستن و تینووی دیتنەوەی راستین دەبێ بە پێوەری ئاوەز چاک و خراپ و راست و ناڕاست لێک‌هەڵاوێرن.

غەزالی بەردەوام تینووی دیتنەوەی راستەقینە بوو و ئەم راستییەش لە بەرهەمەکانیدا بە راشکاوی دیارە. بۆ ئەم مەبەستەش غەزالی لە هەموو بوونێک (وجود) دڕدۆنگە[1] و بە چاوی گومانەوە سەیری

---

[1]- دڕدۆنگ: دوودڵ.

دەکا و هان دەدا بۆ ئەوەی بە پێوەری ئاوەز راستییەکەی بسەلمێنێ. سەرەتا گومان لە بەرهەستەکاندا دەکا (محسوسات). بە هۆی ئاوەزەوە لە راست و ناراستیان دەگا؛ بەلام کاتێ دەگاتە ئەو ئاستەی کە تێدەگا پای ئاوەز چێوییەو لە برینی رێگا بە سەر وشکیدا دەمێنێتەوە و توانی ئەوەی کە ببێتە پالپشت نایمێنێ، ناچار بۆ تێگەیشتن لە راستەقینە دەسەوداوێنی پێوەرێکیتر دەبێ. پێوەرێک کە سەرتر لە ئاوەزە؛ پێوەری کەشف و موشاهیدە.

یەکێک لەو رەخنانەی کە لە غەزالی دەگیرێ ئەوەیە کە دەلێن غەزالی ئاوەز و علییەتی بە هیچ زانیوە. هۆی ئەم بۆچوونەش لە کتێبی «تهافت الفلاسفه»وە سەرچاوە دەگرێ. غەزالی لەم کتێبەدا بە توندی رەخنە لە فەلسەفە دەگرێ و بەو چەشنەی کە دەلێن وا فەلسەفە بە زەویدا دا کە ئیدی لە نێو موسولماناندا سەری بەرز نەکردەوە. هەرچەند بێگومان ئەم پەیڤە موبالەغەیە، بەلام رادەی شارەزایی و دەسەلاتی غەزالیمان پێ پیشان دەدا. ئەو کەسەی کە گەرای ئەم بۆچوونە دەپژێنێتە نێو بیرو هزری زانایانەوە کەسێک نییە بێجگە لە «ابن الرشد اندلسی».

ئیبنوروشد پێی وایە کە غەزالی ئاوەزی بە هیچ زانیوەو لە علییەت لای داوە. بەلام بە وردبوونەوە لە بەرهەمەکانی غەزالی ، بە تایبەت «احیا» و کیمیا لێمان روون دەبێ کە غەزالی نە تەنیا ئاستی ئاوەزی نزم نەکردووە، بەلکوو پلەشی گەلێک بەرز پیشان داوە. بەلام غەزالی دەلێ لەسەر رێبازی راستەقینەدا، بیرو هزر تا ئاست و سنوورێکی رەچاو کراو رێگای پێ دەبردرێ و لەو سنوورە بەولاوە کوور و کۆلەوارە و لە رێگابڕین دەمێنێتەوە. ئەو قۆناغەی کە پێی دەلێن مەعریفەت، هەر ئەم باسەیە. ئەوین و خۆشەویستی لە سۆنگەی زیکرو یادەوە دەگاتە ئەنجام، زیکرو یادکردنەوەش لە سۆنگەی ناسین و زانین. کەواتە یەکەم قۆناغ، زانینەو زانینیش بە ئاوەزە. ئاوەز کاری ناسین و لێک دانەوەی بەرهەستەکانە (محسوسات)[1].

مێژووی هزر ئەم راستییەی ئاشکرا کردووە، کە ئەوەی بەرهەست نەبێ، واتە بە یەکێک لە هەستەکان بوونی نەسەلمێندرێ، ئاوەز ناتوانێ دانی پێدا بنێ. ئاوەز، کاری ناسین و گریمانەیە. بەلام لە گریمانە سەرتر بازنادا و تێناپەڕێ و راستیش سەرتر لە هەر گریمانەیەکە. ئەوەیە کە غەزالی دەلێ هەموو بەرهەمی سۆفییەکانم خوێندەوە، کەچی هیچ هێوریان نەکردمەوەو هیچیان لێ نەگەیشتم؛ چونکە رێگای تەسەووف بە کردەوەیە نەک زەین و هزرو ئاوەز. رێگای راستی پەڕینەوەیە لەم جیهانەو لەم جەستە خۆلینەیە. بازدانێکە بەرەو جیهانێ کە چاوی سەر قەد ناتوانێ ببینێ و هەروەها ناتوانێ بوونی بسەلمێنێ، مەگین بە ئەزموون و پێ نانە نێو ئەم رێگا.

رەنگە زۆرکەس ئەم شک و دڕدۆنگیەی غەزالییە لەگەل گومانی دیکارت هەلسەنگێنن؛ بەلام بە

---

١- بەرهەستەکان: محسوسات.

## ژیانی غەزالی

نەختێ وردبوونەوەو وەرددانەوە ئەم هەڵەیە ئاشکرا دەبێ. دیکارت لە جیهانێ بەرهەست تێنەپەڕا ؛ بۆ دیتنەوەی خالی سەرەتایی ئەم ڕێبازەش هەندێ بنەمای بۆ خۆی ڕەچاو کرد؛ وەکوو ئەوەی کە دەیگوت: چونکە من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم. سەرەتا، بەر لەم بنەمایە، ناچار دەبوایە بوونی خودا بسەلمێنێ، بەلام دەبینین دیکارت بۆ ئەم سەلماندنە هیچ کۆششەوەیەک ناکا. دیکارت دەڵێ لە بوونی خوادا هیچ گومان نییە و لە ڕاستیدا جێی گومان نییە؛ کەواتە خودا هەیە و دەبێ لە بوونی دڵنیا بین. بەلام غەزالی هەم لە ئەحیا و هەمیش لە کیمیا سەرەتا بوونی پەروەردگار بە بەڵگەی هزری دەسەلمێنێ و پاشان دەڕواتە سەر باسی‌تر. ئەو تێگەیشتنەی غەزالی، ئاکامی کەشف و موشاهیدە بوو، نەک زۆرانبازی ئاوەز. غەزالی چاکی دەزانی کە بە بەڵگە و کاری هزری هیچ ڕاستییەکی لێ خویان نابێ.

غەزالی لە سەرەتای ڕێگادا، واتە سەرەتای لاوەتی، گەنجێکی زیپک و زاکوون[1] و لێهاتوو و وریاو تینووی پلە و پاگەو ناو و ناوبانگە. پاش ئەوەی کە بڕیاری خۆی دەداو چش لە هەموو حەزەدونیاییەکانی دەکاو ڕێگای تەسەووف دەگرێتە بەر، سۆفییەکی تەواوە. زۆر لەوانەی ڕەخنەیان لێ گرتووە، بە سۆفییان نەزانیوە بەلام وردبوونەوە لە ژیان و بەرهەمەکانی لێمان ڕوون دەکاتەوە کە سۆفییەکی ڕێزان و لێهاتوو و خاوەنی کەشف و موشاهیدەبووە. غەزالی بوو کە بۆ یەکەم جار بنەما و ئوسلوبی تەسەووفی تیۆریزە کردەوە و لە ئەزموونێکی تاکە کەسی هێنایە دەر و وەکوو بزاڤ یاخۆ ڕێبازێک بۆ ژیاندنەوەی بەها سەرەکییەکانی دینی ئیسلام، ناساندی.

بێگومان بۆ ئەوانەی بە درێژایی ئەم نۆسەدو پەنجا ساڵە ویستوویانە لە دینی ئیسلام یاخۆ ڕاستەقینەی تەسەووف بگەن، ئەحیا گرینگترین سەرچاوەو بنەما بووەو هیچ نووسەرێکی‌تر وەکوو غەزالی کاریگەری بە سەر ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی ئیسلامدا نەبووە.

---

١- زیپک و زاکوون: برشت لە یاسادا.

**سەرچاوەکان:**


١- حنا فاخوری و خلیل جر؛ تاریخ فلسفه در جهان اسلامی. مترجم: عبدالمحمد آیتی. انتشارات علمی.

٢- زرین کوب، عبدالحسین؛ جستجو در تصوف ایران، امیرکبیر.

٣- زرین کوب، عبدالحسین؛ دنباله‌ی جستجو در تصوف ایران.

٤- ابوحامد غزالی، المنقذ من الضلال؛ ترجمه صادق آیینه وند.امیرکبیر.

٥- ابوحامد غزالی، کیمیای سعادت؛ ویراسته‌ی خدیوجم، علمی فرهنگی.

٦- ابوحامد غزالی ، احیاءالعلوم دین؛ ویراسته‌ی خدیوجم؛ علمی فرهنگی.

## سەرەتا

### بەناوی خودای دەهەندەو دلۆڤان
### هەر یارمەتی لەو دەخوازین

سوپاسی لە رادەبەدەر، بە قەدەر دانەدانەی ئەستێران، تنۆکی باران، گەڵای داران و ورد و زیخی بیاوان، وردیلەکانی زەوی و عاسمان بۆ پەروەدگارێک کە تاقانەیی، تایبەت بە خۆیەو شان‌وشکۆ و بەرزی و هێژایی و ریز و بایەخی، لە سنووری فام و ئاوەزی مرۆڤ بەدەرە. هیچ ئافرێندراوێ لە گەورەیی ئەو نازانێ و بێجگە لە خۆی کەس تێی ناگا و پێی ناگا و لێی ناگا. دان‌نان بە سەر ناتوانی لە ناسینی، ئاست و پلەی راسبێژانە و پێ هاتن بە کۆتایی بەندەگی و پەرەستنی، کاری فریشتە و پێغەمبەرانە. دوایین قۆناغی ئاوەز لە ناسینی، ورپوون و دامانە. رێرەوانی پشوودرێژی رێگای پڕ هەڵدێری، دوایین مەنزڵگایان، سەرلێشێوان و ماتی و دامانە. هیوای گەیشتن بە بنەوانی، خەیاڵێکی خاوە؛ بە تەواوی ناسین و پێگەیشتنی، هیوای بەتاڵە. چاو، لە دیداری ئەو تەنیا واق‌بوون بەشیە و هیچی‌تر؛ ئاوەز تەنیا بە قەدەر سەیری سەیر و سەمەرەی ئافرێندراوەکانی بەش دەبات و بەس. کەس بۆی نییە لە گەورەیی ئەودا رامێنێ کە چییە و چۆنە؟ هیچ دڵێک ئیزنی نییە تەنیا تاوێکیش لە دەسکردە سەمەرەکانی ئاگادار بێ کە هۆی بوونیان چییە و کییە؛ تا تێ‌بگا و پێ‌بگا کە لە هەموو شوێنا شۆپی وزەی ئەو دیارە و سەرچاوەی هەموو تیشکێک کانی رووناکی ئەوە و هەموو شتێکی سەیر و نامۆ بە هۆی بەردەباری[1] ئەوەو هاتۆتە دی و هەموویان تیشکی جوانی ئەون و لە ئەون و بۆ ئەون و لە راستیدا خودی ئەون؛ چونکە لە راستیدا هیچ شت بێجگە لە ئەو بوونی نییە و بوونی هەموو بوونەوەرێک پەرتەوێ لە تیشکی ئەوە.

هەروەها درووود و سڵاو بە سەر مستەفا کە گەورە و رێنوما و رێبەری براوادارانەو رازداری نهێنییەکانی پەروەردگارە و بژاردە و خۆشەویستی بینایی چاوانە. درووود لە سەر یاران و بنەماڵەی پاک و بێ‌خەوشی کە هەریەکیان پێشەوای ئوممەت و رێشاندەری رێبازی شەرعن.

---

١- بەردەباری= حیکمەت.

## سەرەتا

بزانە، مرۆڤی بۆ گەپچاڕ نەخولقاندووە؛ بەڵکوو ئەرکێکی مەزن و پڕبایەخی لە ئەستۆی ناوە؛ چونکە هەرچەند لە ئەزەڵەوە نەبووە، کەچی تا هەتاهەتایە دەژی؛ هەرچەند جەستەی لە قوڕی بێ‌فەڕە، کەچی گیانی هی پەروەردگارە و ئێجگار بە نرخە؛ هەرچەند گەوهەری گیانی لەگەڵ دانستە[1]ی دڕندە و چوارپێ تێکەڵ پێکەڵە، کەچی بە کۆشەوە و پشوودرێژی لەم پیسایییە پاکژ و خاوێن دەبێتەوە و شیاوی ئاسانەی پەروەرندەی دەبێ و هەڵکشان لە خوارترینی خوارەکانە بەرەو هەرە بەرزەکان کاری وییە. نزمترین پاگەی مرۆڤ ئەوەیە کە لە دانستەی چوارپێ و دڕندانەدا بمێنێتەوە و هەڵنەکشێ؛ هەرە بەرزیش هەڵاتن و خەڵسین و کۆت و نێل کردنە مل شاوەت و تووڕەیی و دڕندەیی و گەیشتن بە پلەی فریشتەکانە. کە بوو بە خونکار و فەرمانڕەوایان، شیاوی دۆستایەتی پەروەردگارە و ئەمەش بەرزترین ئاستی مرۆڤایەتییە. کە لە چێژی دیداری پەروەرندەی بەهرەمەن بوو، تەنیا تاوێک لە وردبوونەوە و وەرددانەوەی ئەو جوانییە رانامێنی و نوقم بوون لەو جوانییە دەبێتە بەهەشت بۆی و ئەو بەهەشتەی کە چاو و سک و ژێرسک بەهرەی لێ دەبەن، نرخی لە لای ئەو نامێنێ.

چونکە گەوهەری مرۆڤ لە سەرەتای رسکانەوە، کەل و کوتەر و ناتەواوە، قەد پێ‌ناگا و گەشە ناکا، مەگین بە هەوڵ و کۆششی زۆر.

هەروەکوو چۆن ئەو کیمیا کە مس و برینجە دەکاتە زێڕ، کاری دژوارە و هەر کەسەو ئەم کارەی پێ ناکرێ، ئەم کیمیاش کە گەوهەری مرۆڤ لە دڕندەییەوە دەگەینێتە ئاستی فریشتەکان و بەختەوەری هەتاهەتایی، زۆر دژوارترەو بە هەرکەس ناکرێ.

مەبەست لەدانانی ئەم پەرتووکە رافەی لێلی و کۆسپ وتەگەرەکانی ئەم کیمیایەیە کە بەراستی کیمیای بەختەوەری هەتاهەتاییە. هۆی ناونانی ئەم کتێبەش بە کیمیای بەختەوەری هەر ئەمەیە. چونکە، جیاوازی نێوان زێڕ و مس، پتر لە زەردی و قورسی نییە و قازانجی ئەوەش تەنیا بۆ دونیایە و بەس. جا بنواڕە ماوەی دونیا چەندە و نیعمەتی دونیا چییە؟ کەچی جیاوازی نێوان دانستەی چوارپێ و دڕندان لەگەڵ دانستەی فریشتەکان، ئەوەندەیە کە لە خوارترینی خوارەکانەوە تا کوو بەرزترینی بەرزەکان دەڕوا. ئەنجامی ئەمەش بەختەوەری هەتاهەتاییە؛ جا ماوەی ئەم بەختەوەرییە دوایی بۆ نییە و نیعمەتدەری دوایی نییە و هیچ کەم و کوورییەک لە دانستەکانیدا رێی نییە. کەواتە ناوی

---

[1] - دانستە= تایبەتمەندی.

کیمیا بۆ ئەم مەبەستە تەنیا ئەمانەتێکە.

**سەرنج**

بزانە، هەروەکوو چۆن کیمیا لە هەمبانەی پیرەژناندا نییە، بەڵکوو دەبێ لە خەزانەی خونکاراندا بۆی بگەڕی، کیمیای بەختەوەری هەتاهەتاییش تەنیا لە خەزانەی پەروەردگاردا دەبینرێتەوەو بەس. خەزانەی پەروەردگاری مەزن لە ئاسماندا گەوهەری فرشتەکانە و لە زەویدا دڵی پێغەمبەرانە. کەواتە هەرکەس بێجگە لە خەزانەی پێغەمبەر لە شوێنی‌تردا بۆی بگەڕێ، بە هەڵەدا ڕۆیشتووە و ئەنجامی زەغەڵە[1] و ئاکامی پتر لە بۆچوونێک و لاڕێیەک چیدی نییە و لە وەرزی پەسڵاندا هەژاری و بەلەنگازییەکەی خویان دەبێ و بۆچوونەکەی رسوا دەبێ و پێی دەڵێن: فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ[2].

لە رەحمەتەکانی پەروەردگاری مەزن ئەوەیە کە بۆ ئەم مەبەستە سەتو بیستو چوار هەزار پێغەمبەری بۆ خەڵکوخوا ناردووە، تا ئەم کیمیا بە خەڵک فێر کەن و پێیان بڵێن کە چۆن گەوهەری دڵ بخەنە نێو بۆتەی کۆشەوە و ئاکاری نزمی لێ وەدەر نێن و بە ئاکاری جوانی بنەخشێنن. لەم سۆنگەوە بوو کە هەروەک چۆن شانازی بە پادشایی خۆیەوە کرد، بە بۆنەی ناردنی پێغەمبەرانیش شانازی بە خۆی کرد و منەتی نایە سەر خەڵک و گوتی: يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ، هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ [3]. «یزکیهیم» ئەوەیە کە لە ئاکاری ناپەسەند -کە تایبەتمەندی چوارپێیانە- پاکژیان کاتەوە و «و یعلمهم الکتاب و الحکمە» ئەوەیە کە بەرگی فریشتەکانیان دەبەرکا و بیانڕازێنێتەوە. مەبەست لەم کیمیایە ئەوەیە کە لە هەرچی دزێو و نەشیاوە، پوخت و پاراو بکرێیتەوە؛ هەرچیش شیاوە ، پێی بخەملێیتەوە.

سەرلەبەری ئەم کیمیا ئەوەیە کە روو لە دونیا بەرەو خودا وەگێڕی. هەروەک چۆن سەرەتا

---

١- زەغەڵ: بەدەڵ، ناعەسل.

١- (قورئان، ٢٢/٥٠) وا سەرپۆشمان لە سەر لادای، چاوت ئەمڕۆ زۆر بڕ دەکا. (هـ)

٣ - (قورئان، ٦٢/ ١ و٢) هەرچی لە ناو عاسمانەکان و زەمینە، پەسنی ئەو خودایە دەدەن کە پادشایەکی پاک و دوور لە هەموو کەمایەسی و بەدەستەڵات و کارزانە. هەر ئەویشە لەناو نەخوێندەواراندا پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ کل کردن، کە نیشانەکانی ئەویان بۆ وەخوێنێ و لە کتێب و لە کارزانی رایان بێنێ؛ هەرچەند ئەوان لە پێشوودا لەو پەڕی گومڕاییدا بوون. (هـ)

**سەرەتا**

پێغەمبەری فێر کردو گوتی: وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا[1]. واتای «تبتیل» ئەوەیە کە لە هەموو شت دابڕە و نووکـوبەدت بەو بسپێرە. بە کورتی باسی ئەم کیمیا ئەمەیە و لێکدانەوەی زۆر دەبا.

---

١ - (قورئان، ٧٣/ ٨) هەر ناوی پەروەرندەی خۆت بەیاد کەو لە غەیرەز ئەو، هەموو شت بتەکەوە. (هـ)

# پێڕستی ئەم کتێبە

سەردێڕەکانی، ناسینی چوار شتە؛ بنەماکانی دەبنە چوار بەش و هەر بەشە دەبێتە دە کەرت.

## سەردێڕی موسوڵمانی

یەکەم، ئەویە کە راستەقینەی خۆت بناسی.

دووەم، ئەوەیە خوا بناسی.

سێیەم، پاش ئەمانە راستەقینەی دونیات لێ روون بێ.

لە بەشی چواردا راستەقینەی دوارۆژ بناسی.

## بەشەکانی کردەوەی موسوڵمانی

کردەوەی موسوڵمانی، دەبنە چوار بەش: دووی رواڵەتییەو ئاشکرایە، دووی بەرپیوار و نادیارە.

ئەو دوانە کە هی رواڵەتن:

یەکەم- بەجێ هێنانی فەرمانی خوایە و پێی دەڵێن عیبادەت؛

دووەم- راگرتنی دابو نەریتە لە هەڵس و کەوت و ژیان و پێوەندی لە گەڵ خەڵکوخوادا، کە پێی دەڵێن موعامیلات یان کردەوەکان.

ئەو دوانەش کە هی دەروونن و نادیارن:

یەکەم- پاکژ کردنەوەی دڵە لە ئاکاری نزم؛ وەکوو تووڕەیی و چاوچنۆکی و رژدی و لووتبەرزی و خۆ بەزلزانی و مەرایی، کە پێیان دەڵێن کوشندەکان و هەڵەتی رێی دینیشیان پێ دەڵێن.

دووەم- خەملاندنی دڵە بە ئاکاری بەرزو جوان، وەکوو پشوودرێژی، بەکاوەخۆیی[1]، شوکرانەبژێری، خۆشەویستی، رەزامەندی، هیواداری و پشتبەستن، کە پێیان دەڵێن رزگارکەرەکان یا «منجیات».

بەشی یەکەم باس لە عیبادەتە و دەبێتە دە کەرت: یەکەم پتەوکردنی بڕوای ئەهلی سوننەت و جەماعەت؛ دووەم پەرژانە سەر فێر بوون؛ سێیەم تارەت و پاکی؛ چوارەم نوێژ خوێندن؛ پێنجەم زەکات؛ شەشەم رۆژوو؛ حەوتەم حەج کردن؛ هەشتەم قورئان خوێندن؛ نۆهەم زیکر و یادی خوا و دەهەم ویرد و کاتی عیبادەت کردن.

***

بەشی دووەم لە نەریتی کردەوەدایە و دەبێتە دە کەرت: یەکەم نانخواردن؛ دووەم ژنهێنان؛ سێیەم بازرگانی؛ چوارم بە دەستهێنانی بژیوی پاکژ و حەلاڵ؛ پێنج شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵ

---

[1] کاوەخۆ: لەسەرخۆ.

خەلکوخوا؛ شەشم نەریتی دوورەپەرێزی؛ حەوتم داب و نەریتی سەفەر کردن؛ هەشتم نەریتی سەما؛ نۆیەم فرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە و دەیەم شێوازی حوکمداری کردن.

***

بەشی سێیەم برینی ملە و هەڵەتەکانی رێی دینە کە پێی دەڵێن کوشندەکان و ئەمەش دەبێتە دە کەرت: یەکەم شرۆڤەی کۆشەوەی نەفس و دەرمانی ئاکاری نزم و چرووک و بە دەستهێنانی ئاکاری بەرز؛ دووەم باس لە ئارەزووی سک و ژێرسک؛ سێیەم دەرمانی تامەزرۆیی پەیڤین و زیانەکانی زمان؛ چوارم دەرمانی نەخۆشی توورەیی و رژدی و بەرچاوتەنگی؛ پێنجم باس لە خۆشەویستی دونیا و دەرمانی چاوبرسێتی دەکا؛ شەشم دەرمانی بەخیلی و رژدی و کۆوەکردنی سامان؛ حەوتم دەرمانی خۆشەویستی پلە و پاگە و شانوشکۆ و پەیڤین لە مەڕ زیانەکانی؛ هەشتم دەرمانی مەرایی و رووبینی و دوڕازی لە عیبادەتدا؛ نۆیەم دەرمانی لووتبەرزی و خۆبە زلزانی؛ دەیەم باس لە دەرمانی بێئاگایی و سەرلێشێوان و رێ بزر کردن.

***

بەشی چوارم باس لە سەر رزگارکەرەکانە و ئەمیش دەکەرتە: یەکەم باس لە سەر تەوبە و پاشگەز بوونەوە لە گوناح؛ دووەم باس لە پشوودرێژی و شوکرانەبژێری؛ سێیەم ترس و هیوا؛ چوارم هەژاری و پارێزکاری؛ پێنجم راستی و بێخەوشی؛ شەشم بە خۆڕاگەیشتن و چاودێری؛ حەوتم رامان و بیرکردنەوە؛ هەشتم تاکپەرستی و پشت بە خوا بەستن؛ نۆیەم باس لە خۆشەویستی و تامازرۆیی و دەیەم یادی مردن کردن.

***

لەم کتێبەدا سەرجەمی ئەم چوار بەش و چل کەرتە راڤە دەکەین بۆ فارسیبێژان؛ خۆ لە باسی دوور و درێژ و ئەستەم و ورد و باریک دەبوێرین تا هەمووان تێیبگەن. گەر کەسێک وردبوونەو تێگەیشتنی فرەتری دەوێ، با لە کتێبە عارەبیەکاندا ورد بێتەوەو وەردیان بداتەوە، وەکوو کتێبی «احیاء علوم الدین» و «جواهر القران» و نووسراوەیتر. چونکە ئەم کتێبە بۆ خەڵکی لاوەکی نووسراوە کە ویستوویانە بە فارسی بۆیان بنووسم، دەبێ لە ئاستی تێگەیشتنیان لا نەدەم.

پەروەرندەی مەزن مەبەستی ئەوان لەم داواکارییە و مەبەستی من لەم پەرسڤدانەوە، پاک و بێخەوش کا و لە لێلی مەرایی و رەشی رووبینی بمانپارێزێ؛ بە هیوای رەحمەتی ئەوین. هەروەها رێگای چاکەمان بۆ ئاوەلا کا و رێ برین و سەرکەوتنمان پێ خەلات کا تا ئەوەی بە سەر زاردا تێدەپەڕێ، بە کردەوەش هەر ئاوەها بێ؛ چونکە گوتەی بێکردە بە فێڕۆ چوونە و دەستووری بێ کۆشەوە ئۆبالی دواڕۆژە. پەنا دەبەینە بەر خودا.

سەرەتای ئەم کتێبە

## شرۆڤەی سەردێڕی موسوڵمانی

---

یەکەم- ناسینی نەفسی خۆ

دووەم- ناسینی پەروەردگاری مەزن

سێیەم- ناسینی دونیا

چوارەم- ناسینی پەسڵان

## سەردێری یەکەم: خۆناسین

باش بزانە کە کلیلی ناسینی خوای مەزن، خۆناسییە؛ بۆیە گوتوویانە مَن عَرَفَ نَفسَهُ، فَقَد عرف ربه؛ خواش فەرمووی: ءَايَـٰتِنَا سَنُرِيهِمۡ فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ [1]؛ بە گشتی هیچ شتەک لە تۆوە بە تۆ نزیکتر نییە؛ کەواتە، تۆ کە خۆت نەناسی، چۆن کەسیتر دەناسی؟ ڕەنگە بڵێی خۆم دەناسم، کەچی هەڵە دەکەی و ئەو ناسینە کلیلی ناسینی خوداوەند نییە. بەڵکم چوارپێش هەر ئەو جۆرە خۆیان دەناسن: بێجگە لە دەست و پێ و سەرو ڕوو و گۆشت و پێستی ڕواڵەتت چی دی ناناسی. لە دەروونی خۆشت هەر ئەوەندە دەزانی کە برسیت بوو، بخۆی و توورە بووی، بە شەڕ بی و شاوەتت زۆری هێنا، ژن بێنی و لەمانەشدا هەموو حەیوانێک دەگەڵت یەکسانن. کەواتە لەسەرت پێویستە کە ڕاستەقینەی خۆت ببینیتەوە و بزانی لە کوێرا هاتووی، بۆچی هاتووی و بۆ کوێ دەڕۆی؛ بۆ هاتووینە ئەم هەوارگە و هۆی هاتنت بزانی و تێبگەی بەختەوەریت چییە و لە چییایە؛ کۆڵەواریت چییە و چۆن دەتوانی خۆتی لێ بپاریزی.

باش بزانە ئەم ڕەوشتانە کە لـە تـۆدا کـۆوەکراون، بەشـێکی هـی چوارپێیانـە و بەشـێکی دڕندانـە و پاژێکی ڕەوشتی دێو و درنجانە و کەرتێکیشی هی فریشتانە. باش ڕابمێنە و بە خۆدا بچـۆرەوە و بزانـە کام یەک لەم ڕەوشتانە هی تۆیە و ئەوانیتر لە لات نامۆن. گـەر بـاش لەمـە تێنەگـەی ڕێ نابەیتـەوە مەنزڵگای بەختەوەری؛ چونکی هەر یەک لەمانـە خـواردنێکی هەیـە و بەختەوەریـەک: بەختـەوەری چوارپێ لە خواردن و خەوتن و جووتبوونایە؛ ئەگەر چوارپێیت هەوڵ بدە تا شـەو و ڕۆژ پـەرای سـک و ژێر سکت کەی. خـواردن و بەختـەوەری دڕنـدان، کوشـتن و بـڕین و لێـدان و دڕیـن و توورەبوونـە. خواردن و بەختەوەری دێوان لە هەڵخڕاندنی شـەڕ و ئاژاوە و دزی و فزی و گزیدایە؛ ئەگەر بـە ڕەوشـت

---

١- ها کا وامان کرد ئەوانە لە ئاسۆکانی زەمین و عاسماندا و لە خۆشیاندا، نیـشانەکانمان ببیـنن؛ هـەتا لێیـان ڕوون بێتـەوە کـە ئـەو ڕاستە(هـ).

لەوانی، دەسا وەخۆکەوە لە هاوالانت جێ نەمێنی و ئارخەیان[1] بی. خواردن و بەختەوەری فریشتەکان دیتن و نوقم بوونە لە سەیری سیمای خێوی خۆیان و لە خوو و خدەی ئەوانەی بێزران، چاک و پاکن. ئەگەر تۆش بە ڕاس ئاکاربەرزی وەک فریشتەکان، هان بدە خوای خۆت بناسی و ڕێ بەریتە بەر بارەگای پڕشکۆی و خۆت لە هەرچی دەبێتە کۆسپی ڕێگات پاقژ کەوە و تێبگە بۆچی ڕەوشتی نزمی چوارپێ و درندە و دێویان پێ ئەسپاردووی؛ بزانە بۆ وەی پێت دراون کۆت و بەندی بەندەییت لە ئەستۆ کەن و بتخەنە بەر بێگار؟ جا بوێرانە بێرە مەیدان و ژیرانە بیانناسە و بەر لەوەی ڕاوت کەن ڕاویان کە و دەسەمۆیان کە و لەم ڕێگا پڕ لە هەورازەی کە وەپێشت نراوە سواری یەکیان بە و ئەوانیتر بکە بە پاسەوانی خۆت و باش ئاگات لێیان بێ؛ تا ئەم چەن ڕۆژەی بارگەت لەم هەوراگەیە، بیانگرە بێگارو تووی بەختەوەریت بچێنە، تا دوارۆژ هۆشەت پڕ دان بێ. کە خەرمانی بەختەوەریت هەڵگرت، ئەوسا بارگەت بەرەو تەختی بەختەوەریت لێک بنێ - ئەو تەختەی خاسان پێی دەڵێن دیداری خوداو عەوام پێی دەڵێن جەننەت.

دەبێ لەم واتایانە تێبگەی تا لە خۆت بگەی؛ چونکوو هەرکەس ئەمەی نەزانێ، لە توێکڵی مەبەست بەو لاوە چیدی دەست ناکەوێ.

## بەشی یەکەم: جەستەی ڕوانەتی و مانای ڕۆح

گەر دەتەوێ خۆت بناسی، باش بزانە کە لە دوو پاژ خولقاوی: یەکەم ئەو جەستەیە کە بە چاوی سەر دەبینرێ و پێی دەڵێن لەش؛ ئەو پاژیتر کە بە چاوی سەر نابینرێ و دەبێ بە چاوی دڵ سەیری بکرێ، پێی دەڵێن گیان، دڵ و دەروون.

ڕاستەقینەی تۆ ئەوەیە کە گیانی پێ دەڵێن و بێجگە لەمەش، هەرچی هەیە شوێنکەوتووی گیانە و پاسەوان و سەربازی وین. ئێمە بەم سەرۆکە دەڵێین «دڵ». بزانە کاتێ کە باسی دڵ دەکەین، مەبەستمان ئەم ڕاستیەیە کە هەندێ جار «نەفس»ی پێدەڵێن و برێ جار «گیان»، نەک ئەو پارچە گۆشتەی کە لە لای چەپی سنگت دایە و بە چاوی سەر دەبینرێ و ئاژەڵ و مردووانیش هەیانە و ڕیزێکی واشی نییە. بە گشتی ئەوەی بە چاوی سەر دەبینرێ، خەڵکی ئەم دونیایەیە کە پێی دەڵێن عالەمی بینراو. دڵ خەڵکی ئەم عالەمە نییە و بە ڕێبواری کەوتۆتە ئێرە. ئەم دڵە گۆشتینەش کە دەیبینی بۆ خزمەت و کاری ئەوە و هەموو ئەندامانیتر وەک سوپاو لەشکری وین و پەرای دڵ دەکەن و دڵیش خوونکاری وڵاتی لەشە. ناسینی خوای مەزن و شاد بوونەوە بە جوانی جوان‌خولقێن و برینی ڕێگای خوا، ئەرکی ئەوە و ڕووی پەیڤی خوا هەر لەوە و توندی و نەرمیەکانی

---

[1] - ئارخەیان: خاترجەم.

پەروەردگار بۆ ئەوە و ئەوەی کە بە خزمەت بەختەوەر دەبێ یاخۆ بە لاساری کۆڵەوار، هەمیسان دڵە و ئەندامانی‌تر هەموویان دواکەوتەی وین. کلیلی گەیشتن بە دلۆڤانی خواش، ناسینی ڕاستەقینە و دانستەکانی دڵە.

هان بدە باش بیناسی؛ چونکی ئەمە گەوهەرێکی هێژایە و لە ماکی گەوهەری فریشتەکانە و سەرچاوە و بنەماکەشی هەر خوایە: لە لای وی هاتووە و بۆ لای وی دەگەڕێتەوە. هەڵوەدای دونیا بووە و بۆ بازرگانی و جووتیاری هاتووە. لە دواییدا بە وردی لە واتای «جووتیاری و بازرگانی» دەگەیت. ئەگەر خودای مەزن ڕای لە سەر بێ!

## بەشی دووەم: ناسینی ڕاستەقینەی دڵ

بۆ ناسینی دڵ، دەبێ سەرەتا بوونی بناسی و پاشان شارەزای لەشکرەکەی بێ‌و پێوەندی دەگەڵ ئەم لەشکرە بزانی و لەمەش بگەی کە چۆن خوا دەناسێ و دەگاتە مەنزڵگای بەختەوەری. هەر یەک لەمانە ئاماژەیەکی پێ دەکرێ.

بوونی دڵ ئاشکرایە: کە مرۆڤ لە بوونی خۆی هیچ دردۆنگ نییە. مرۆڤ شتێکە بێجگە لەم جەستەیە؛ چونکە بێگومان هەموو مردوویەکیش لەشی هەیە؛ بەڵام هیچ مردوویەک گیانی نییە. ئێمە بە تەماین لە سۆنگەی ئەم دڵەوە، ڕاستەقینەی گیان بناسین. گەر ئەم گیانە نەبێ، لەش مردوویەکە و هیچی‌تر. ئەگەر کەسێک دەست لە لەشی خۆی بەربداو سەرتر بڕوانێ و چاوی دڵی بەسەر زەوی و ئاسمان و ئەوەی تێیدایە بنووقێنێ، بێگومان خۆی دەناسێتەوە و هەرچەن فرەتر لە لەشی خۆی و ئەوانەی دەورو پشتی ئاگای ببڕێ، پتر لە ڕاستەقینەی خۆی دەگات. ئەوەی بە وردی لەم بابەتە ڕابمێنێ و تێی بگات، نەختێ چاوی بە سەر ڕاستی دواڕۆژ دەکرێتەوە و دەزانێ کە دەکرێ ئەم جەستەیە لێ بستێننەوە، بەبێ ئەوەی فەوتابێت و کەوتبێتە دونیای نەمانەوە.

## بەشی سێهەم: ڕاستەقینەی دڵ

ئەوەی کە دڵ چییە و سیفەتی تایبەتی وی کامەیە، شەریعەت ئیزنی ڕاڤەی نەداوە. پێغەمبەری خوداش چونکە خودا فەرمووی:یَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى [1]، خۆی لە ڕاڤەی لاداوە. گیان لە ڕیزی کارەکانی خودایە و لە دونیای ئەمرە؛ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ [2]. عالەمی ئافراندن‌و عالەمی

---

١ - (قورئان١٧/٨٥) لە تۆ دەپرسن گیان چییە. بێژە گیان هەر لەوانەیە کە پەروەرندەم دەیزانێ. (هـ)

٢ - قورئان ٧/٥٤. ئافراندن و ڕاگەیشتن هەر هی خوایە. (هـ)

ئەمر(ڕاگەیشتن) لێک جیاوازن. هەرچی بە مەودا[1] و ڕادە پێورا، عالەمی ئافراندنی(خلـق) پـێ دەڵـێن. بناوانی وشەی خەلق دەگەڕێتەوە بۆ تەقدیر. دڵی مرۆڤ بە ڕادە و هەژمـار نـاپێورێ؛ بۆیـە دابـەشـیش ناکرێ. کە ئەگەر دابەش بکرایا، شیاو بوو کە لە ڕەهەندێکەوە لە سەر بابەتێک نەزان بوایە و لە هـەمـان کات و لە هەمان ڕەهەندیشدا زانا؛ واتە لە یەک کات و لە سەر یەک شت هەم زانا دەبوو هەم نەزان.

ئەم گیانە هەرچەند دابەش ناکرێ و ناپێورێ، بەڵام ئافەریدەیە. «خەلـق» بـە ئافەریـدەش دەڵـێن. کەواتە، بە گوێرەی ئەم بۆچوونە، گیان لە ڕیزی خەلقە و بەو واتایە کـە نـە لـە پێوانـە دەدرێ و نـە لـە ژماردنایە و نە دابەش دەکرێ، دەڕواتە ڕیزی عالەمی ئەمرەوە.

ئەوانەی کە وتیان گیان کەونە، هەڵەیان کردو ئەوانەش کە بە نێوار[2]یان زانـی، بـە هـەڵـەدا چـوون؛ چونکی عەرەز (نێوار) ناتوانێ بە هۆی خۆیەوە ڕاوەستاو بێ و خـۆی پێـڕەوە. گیـان بنـەمـای مرۆڤـە و هەموو ئەندامانی‌تر دواکەوتە و پێڕەوی وین؛ کەواتە چۆن دەکرێ نێوار بێ؟

ئەوانەش کە کوتیان گیان لە لەشە، ئـەوانـیش هـەڵـەیـان کـرد؛ چونکـە لـەش دابـەش دەکـرێ و دەپێورێ، کەچی گیان، پێوان‌و دابەش بوونی لێ نامۆیە.

بەڵام گیانێکی‌ترمان هەیە کە هەم دابەش دەکرێ و هەمیش دەپێورێ؛ ئەو گیانە، نـە ئـەو گیانـەیـە کە هۆی ناسینی خوایە. هەموو گیاندارو ئاژەڵانی‌تریش ئەو گیانەیان هەیە. بەڵام ئەو گیانەی کە ئێمـە پێی دەڵێین دڵ‌و شوێنی ناسین‌و دیتنی خودایە، نە ئاژەڵان هەیانەو نـە جـەسـتەیـە و نـەش نێـوارە؛ بەڵکوو گەوهەرێکە لە ماکی گەوهەری فریشتەکان.

ڕاستەقینەی ئەم دڵە لە وتن نایە و دژوارە. لە سەرەتای ڕێگای دینیشدا پێویست بـە زانـینی نییـە؛ چونکوو سەرەتای ڕێگای دین تێکۆشانە(مجاهدە). ئەوەی بە تـەکـووزی تێبکۆشـێ، خـۆی بـە وردی‌و بەبێ وتن لەم ڕاستییە دەگات. ئەم ناسینە لە ڕیزی ئەو ڕێنواندنـەیـە کـە خـودای مـەزن فـەرمـووی: وَٱلَّذِينَ جَـٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا [3]. کەواتە ڕاڤەی گیـان بـۆ ئـەو کـەسـەی بـە تـەواوی لـەم ڕێبـازە تێنەکۆشاوە، شیاو نییە.

بەر لە خەزا، دەبێ لەشکرێ دڵ بناسرێ؛ چونکە ئەوەی سوپای خۆی نەناسێ، شەڕی پێناکرێ.

---

١- مەودا: کات و سات.

٢ - عَرَض.

٣ - قورئان (٦٩/٢٩). ئەوانەی لە ڕێبازی ئێمەدا تێدەکۆشن، ئێمەش لە ڕێگای خۆماندا دەیانبەین. (هـ)

## بەشی چوارەم: دڵ خوونکاری[1] لەش

باش بزانە کە لەش، وڵاتی دڵە و لەم وڵاتەدا دڵ وەکوو پادشا، خودانی لەشکری جۆراوجۆرە: وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ [2]. دڵ بۆ ئەو دونیایتر خولقاوەو کاری تەقالایە بۆ گەیشتن بە بەختەوەری دوارۆژ. بەختەوەریشی لە ناسینی خوای گەورەیە و ئەم ناسینەش لە سۆنگەی ناسینی دەسکردەکانی خواوە بە دەس دێ؛ ئەو دەسکردانەش بریتین لە نووکوبەدی ئەم جیهانەی کە برێکی لێمان دیارە و برێکیشی بەرپیوارە. ناسینی سەیرو سەمەرەکانی عالەم بە هۆی هەستەکانی مرۆڤەوە پێک دێو ئەم هەستانەش بە هۆی لەشەوە ڕاوەستاون.

کەواتە ناسین، «نێچیر»ە و هەستەکان «داو»و لەشیش ئەسپو باربەری دڵە. ئەمەیە هۆی پێویستی دڵ بە لەش.

لەش پێک هاتووە لە ئاو و خاک و تین و شێ[3]؛ چونکە لاوازە، لە دەرەوە برسێتیو تینوێتیو لە ناوەوە ئاوو ئاورو هەروەها تەمای دوژمنانو دڕندان مەترسین بۆ لەناو بردنی. کەواتە بە هۆی برسێتیو تینوێتیەوە پێویستی بە خواردنو خواردنەوەیە. بۆ ئەم ئەرکە دوو لەشکری پێوستە: یەکیان ڕواڵەت: وەکوو دەستو پێو دەمو زارو دان؛ ئەویتر لە ناوەوە: وەکوو شاوەتی خواردن و خواردنەوە.

بۆ ڕاوەدوونانو بەربەرەکانێی دوژمنانی دەرەوە، پێوستی بە دوو سوپایە: یەکەم لە ڕواڵەتدا: وەکوو دەست و پێ و چەک؛ دووهەم لە ناوەوە: وەکوو ڕق و قین و شاوەت.

دیارە مرۆڤ تا خواردنێک نەبینێ تامەزرۆی نابێو تا دوژمنێکیش نەبینێ، بەرەنگاری ناکا؛ کەواتە بۆ ناسینی ئەمانەش نیازی بە زانایی هەیە. هەندێ لەم زانیارییانە بە هۆی ئەندامانی لەشیەوە بەدەس دێنێ کە ئەمانەش پێنج هەستن: چاو بۆ هەستی بینین، دەمو زار بۆ تامو چێژ، دەستو لەش بۆ هەستی ساوایی، گوێ بۆ هەستی بیستن و کەپۆ[4] بۆ بۆنکردن. هەندێکیش بە هۆی ئەندامانی دەروونێیەوە، کە مەنزڵگایان مێشکە؛ وەکوو: هێزی خەیاڵو داڵغە[5]، بیرکردنەوە و لەبەرکردن، هێنانەوە بیرو تەوەهوم.

هەر یەک لەم هێزانە کارێکی تایبەتی هەیە و ئەگەر یەکێ یەکیان کەوێ، ئەو مرۆڤە هەم لە کاری

---

١- خوونکار: پاوشا، پاشا.

٢- (قورئان، ٣١/٧٤). لەخوابەدەر کەس ژمارەیان نازانێ. (هـ)

٣- شێ: نم، تەڕایی.

٤- کەپۆ: لووت.

٥- داڵغە: خەیاڵ.

دینو هەم دونیا تووشی بۆشایی[1] دێ.

بە گشتی ئەم سوپایانە لە ژێر ڕکێفو فەرمانی دڵ دانو دڵ خوونکاری هەمووانە: کە فرمانی بە زار دا، دێتە گوتن؛ کە فەرمانی بە دەست دا؛ ڕادەگرێ؛ کە بە پای فەرموو، دەڕوا؛ کە بە چاوی گوت، دەڕوانێو کە بە بیریشی گوت، ڕادەمێنێ. هەموو ئەمانە خراونەتە ژێر ڕکێفی دڵ تا لەش ڕاگرنو توێشوویان هەڵگرنو بنەوبارگەیان لێک بنێنو نێچیریان ڕاو کەنو تووی بەختەوەری بچێننە خاکو بە هۆشەی پڕدانەوە بگەڕێنەوە بۆ جیهانی هەرەمانەوە.

فرمانبەرداری ئەم سوپایە وەکوو فرمانبەرداری فریشتەکانە لە پەروەردگار، کە ناتوانن لە فرمانی خودانی خۆیان قوتار بن. بەڵکوو بە پێی سروشت، فەرمانبەرداری دڵن.

## بەشی پێنجەم: لەشکری دڵ

بەتەواوی ناسینی دڵ گرانە و درێژخایەن؛ بەلام تا ئەو ڕادەی پێوستە بە نموونەیەک بۆتی ڕوون دەکەمەوە:

بزانە لەش وەکوو شارێکە و دەست و پێ و ئەندامانیتر کرێکارو سەپانو وەرزێرنو شاوەت فرمانبەری کۆکردنەوەی پیتاکە و تووڕەیی پاسەوانە و دڵیش خوونکاری ئەو شارەیە؛ ئاوەزیش وەزیر. کەواتە دیارە پادشا بۆ هەڵسووڕاندنی وڵات پێویستی بە هەموو ئەمانەیە.

بەلام شاوەت کە فرمانبەری کۆکردنەوەی پیتاکە، درۆزنو دڕدووک[2]و هەرزەبێژە؛ هەرچی ئاوەز — کە وەزیرە— دەیڵێ، ئەم بەراوەژووی دەبزوێو هەموو دەم دەیەوێ ئەوەی زێڕ و دراوە لە وڵاتی لەشدا، بە بیانووی پیتاکەوە کۆی کاتەوە.

ئەم تووڕەییەش کە پاسەوانە، گەلێک شەڕانیو توندو تیژە و حەزی لە کوشتو بڕینە. کەواتە ئەگەر خوونکاری شار، دەگەڵ وەزیری خۆی ڕاوێژ بکاو فرمانبەری درۆزن لە ژێر ڕکێفی خۆی ڕابگرێو نەهێڵێ سەربزێو بێو بە پێچەوانەی وەزیر ببزوێو پاسەوانی بە سەردا زاڵ بکاو لە دڕدووکی بیپارێزێو هەروەها سەرو گوێلاکی پاسەوانیش بکوتێو نەهێڵێ زیادەڕۆیی بکا و کۆتی بەندەیی لە گەردنی کا، کاری وڵاتی لەش ڕێکوپێک دەبێو ڕێگای بەختەوەریو گەیشتن بە پەروەرێنەری بە تەکووزیو بێ گرێو گۆڵ دەبڕێ. بەلام ئەگەر ئاوەز بکاتە ئەسیری شاوەت و تووڕەیی، وڵات کاول و بۆ خۆیشی چارەڕەشو بێدەرەتان دەبێ.

---

١- بۆشایی: خلا.

٢- دڕدووک: خۆتێهەڵقوتێن (فزول).

**بەشی شەشەم: دەسەڵاتداری دڵ**

بەم پەیڤەی بێژرا تێگەیشتی کە شاوەتو تووڕەیی کاریان دابین کردنی خواردنو خواردنەوە و ڕاگرتنی لەشە؛ کەواتە هەردوویان مجێوری لەشنو خواردن و شاوەتیش وەکوو ئالفن بۆ لەش. لەش بۆ باربەری هەستەکان خولقاوە. هەستەکانیش سیخوڕی ئاوەزن؛ تا وەکوو ئامرازێک جوانکارییەکانی پەروەردگاری بۆ ڕابگوێزنەوە. کەواتە هەستەکانیش خزمەتو پەرای ئاوەز دەکەن. ئاوەز بۆیە خولقاوە تاکوو ببێتە شەمەو چرای سەر ڕێگای دڵ؛ تا دڵ بتوانێ بە هەوێنی ڕووناکی ئەو، سەیری سیمای خودای خۆی بکات. لە ڕاستیشدا دیتنی خودا، بەهەشتی دڵە. ئاوەزیش خزمەتکاری دڵە. مەبەست لە خولقاندنی دڵیش سەیری پەروەردگارە. بۆیە ئەگەر لەم ڕێگایەدا تێبکۆشێ، بەندەو خزمەتکاری دەرگای پەروەردگارە. واتای ئەوەش کە خودا فەرمووی:وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ [1]، هەر ئەمەیە.

کەواتە دڵیان خولقاند و ئەم وڵاتو لەشکریانە پێ سپارد و ئەم لەشیانە بۆ تەرخان کرد تا لە جیهانی خاکییەوە سەفەرێک بکا بۆ بەرزترینی پێگەکان. ئەگەر دڵ بیەوێ ڕەسمی بەندەیی خوداوەند بەجێ بێنێ، دەبێ وەکوو خوونکار لە سەرووی وڵاتی لەش بنیشێو خوا بکاتە قیبلە و ئامانجی خۆیو دونیا وەکوو کەپرو هەوارێ بزانێو کۆشکو تەلاری هەمیشەیی خۆی لە دواڕۆژدا بکاتەوە. لەش بکاتە باربەری خۆیو دەستو پێو ئەندامانیتر بکاتە شاگردو پێشکار. ئاوەز بکاتە وەزیرو شاوەتیش بە گزیرو کوێخاو تووڕەییش پاسەوانو هەستەکانیشی بکاتە سیخوڕ و هەریەکان لە عالەمێکدا ڕاسپێرێ بۆ گواستنەوەی هەواڵەکان. هێزی خەیاڵ -کە لە سەرەتای مێشک دایە- ڕاسپێرێ بۆ وەرگرتنی ئەو هەواڵانەی هەستەکان ڕایدەگوێزنەوە. لە هێزی لە بەرکردن -کە لە ئاخری مێشک دایە- توێشوو هەڵگرێ چێ بکا، تاکوو ناملکەی هەواڵەکان لە هێزی خەیاڵ وەربگرێو لە کاتی شیاودا بیداتە خزمەت ئاوەزی وەزیرو وەزیریش بە گوێرەی ئەو هەواڵانەی دەیانخوێنێتەوە، بەرنامەی وڵاتداریو چۆنیەتی سەفەری پادشا دابڕێژێو ئەگەر هاتوو یەکێک لە سەربازانی سوپای پادشا-شاوەت یان تووڕەیی- لە پادشا سەربزێو بوو و بە جێی ئەوەی ڕێدارو ڕێنوما بێ، بوو بە ڕێگرو ڕێبڕ، ئەوا وەزیر بە ژیریو کارزانی خۆی چارەسەری دەکاو بە ژیریو سیاسەت بە جێی کوشتنو لەناو بردنی، گوێڕایەڵو گوێ لە مستی دەکا؛ چونکە باش دەزانێ ئەم کاروانە بەبێ سوپایەکی بە هێز قەد لەم هەورازە سەرناکەوێو ئەم ڕێگا هەڵەتە نابڕێ. کە دڵ بەم چەشنە

---

١- (قورئان، ٥٦/٥١) من هەر بۆیە جندۆکە و مۆم دروس کرد، بمپەرستن.(هـ)

ولاتداری کرد، ئەرکی خۆی بە جێ هێناوە و لە کاتی خۆی، بەختەوەریو کامەرانی چاوەنۆڕیە. بەڵام ئەگەر بە ئاوەژووی ئەمە بزاوتەوە و بوو بە یاری ڕێگرو دوژمنان، ئەوا ناسپاسی نیعمەتەکانی خودای کردووە و بە خەسارو زیان تووش بووە و سزای ئەو تاوانەشی دەبینێ.

## بەشی حەوتەم: بنەماکانی چاکە و خراپە لە مرۆڤدا

بزانە کە دڵی مرۆڤ دەگەڵ هەریەک لەم سەربازانەی خۆی، پێوەندییەکی هەیە و لە هەر یەکەشیان جۆرە ئاکارێک وەردەگرێ. هەندێ لەم ئاکارانە ناحەزنو دەبنە هۆی فەوتاندنی دڵو برێکیشیان بەرزو جوانن‌و دەبنە هۆی بەختەوەری. هەموو ئەم ئاکارانە -هەرچەند زۆریشن- دەبنە چوار بەش: ئاکاری چوارپێیان، دڕندە و جندۆکە و فریشتان. چونکە شاوەتو چاوچنۆکیان پێداوە، کردەوەی چوارپێیانی لێ دەوەشێتەوە؛ وەکوو پەل وەشانن بۆ خواردن‌و جووت بوون. چونکە تووڕەییان پێداوە، وەکوو سەگو گورگو شێرو دڕندانیتر، بە دەستو زار، کوشتن‌و برین‌و درینی لێ دەوەشێتەوە. چونکە گزیو فزیو خاپاندن‌و شەڕنانەوەی پێدراوە، کاری دێوو درنجانی لێ دەوەشێتەوە. هەروەها چونکە عەقڵو ئاوەزیشی پێدراوە، وەکوو فریشتەکان دەبزوێتەوە و حەزی لە زانین‌و چاکە کردنە و خۆی لە کاری ناپەسەند لادەداو خەڵکی هان دەدا تا بە ئاشتی بژین؛ خۆیان خۆش بوێتو لە هەرچی کاری سووکو ڕەزیلە خۆ ببوێرن‌و با بە زانین بگەشێنەوە و شاد بن‌و بە نەزانی بژاکێن‌و خەم دایانبگرێ.

بەراستی کە لە پێستی هەر مرۆڤێکدا چوار شت شراوەیە: سەگیو بەرازیو دێویو فریشتەیی. سەگ نە بە هۆی ڕواڵەتو دەستو پێوە خراپەی دەبێژرێ، بەڵکوو بە هۆی ئەو خوویە کە لە دەروونی دایە و بەو هۆوەوە دەگەڵ خەڵکی بە شەڕ دێ. بەرازیش بۆیە خراپەی دەبێژرێ، چونکە گەلێک چڵێس و چاوچنۆکەو خولیای شتی پیس‌و ناڵەبارە. لە ڕاستیدا مەبەست لە گیانی سەگیو بەرازی ئەم تایبەتمەندییانەیە. لە مرۆڤیشدا ئەم واتایە بەدی دەکرێ. هەروەها مەبەست لە خووی شەیتانیو فریشتەیی هەر ئەوەیە کە پێشتر بێژرا.

فەرمان دراوە بە مرۆڤ، بە ڕووناکی چرای ئاوەز- کە لە ئاسەواری ڕووناکی فریشتەکانە- گزیو فزییەکانی شەیتان بناسێتو پووچەڵیان کاتەوە و بەرماڵی سەرشانی داخا. هەر وەکوو پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) فەرمووی: «هەموو مرۆڤێک شەیتانی هەیە و منیش هەمە. بەڵام بینایی چاوان منی بەسەریدا زاڵ کردووە، بۆیە پێی ناکرێ هیچ زیانم لێ بدا».

بە مرۆڤ فرمان دراوە کە بەرازی چاوچنۆکیو تەماو نەگریسیو سەگی تووڕەییو توندی بێنێتە ژێر ڕکێفو چاودێری ئاوەز، تا بەبێ ئیزنی ئەو نەبزوون. ئەگەر وای کرد، لەم کارەی بە ئاکاری بەرزو

جوان دەڕازێنەوە؛ هەر ئەم ئاكارە بەرزەشە كە دەبێتە گەرای بەختەوەری.

كەچی ئەگەر بەئاوەژووی ئەمە بڕاوتەوە و پەرایانی كرد، ئەوا تووشی ئاكاری نزمو سووک دەبێ؛ كە هەر ئەمەیە تووی چارەڕەشیو نەهامەتی دواڕۆژ. ئەگەر لە خەو یان لە بێداریدا بتوانێ پەردە لە سەر ڕاستەقینەی ئەحوالی خۆی لا بدا، خۆی دەبینێتەوە كە چۆن كۆتی كۆیلەیی بەرازێک، یان سەگێک یاخۆ دێوێكی لە مل كردووە. ئەوەی موسولمانێک بخاتە بەندی كافرێک، خویانە لە چ بارودۆخێكدایە؛ جا ئێستا ئەوەی فریشتەیەک بخاتە داوی سەگو بەرازو دێوێک، بارودۆخی گەلێک نالەبارترو پڕمەترسیترە.

ڕاستەكەی ئەوەیە زۆربەی خەلكی -ئەگەر نەختێک ئاكاری خۆیان لێک بدەنەوە و بە كردەوەی خۆیان ڕابگەن- شەو و ڕۆژ پەرای حەزو داخوازەكانی نەفسی خۆیان دەكەنو هەرچەن بە ڕوالەت مرۆڤن، كەچی لە ڕاستیدا خزمەتكاری بەرازو سەگو دێون. بەلام لە ڕۆژی پەسلاندا هەموو پەردەیەک لادەدرێو ڕوومەتی ڕاستەقینە خویان دەبێ. لەو ڕۆژەدا ئەوەی لە بەندی ئارەزووەكانیدا بووبێ، لە ڕوالەتی بەرازو ئەوەش كە تووڕەیی بە سەریدا زال بووبێ، لە پێستی گورگدا دێتە جوزوور. بۆیە ڕاڤەی گورگ لە خەودا مرۆڤی زالمەو ڕاڤەی بەرازیش مرۆڤی پیسی نەگریس. چونكە خەو نوێنەرو پێشاندەری جیهانی پاش مردنە: گیانی مرۆڤ بە هۆی خەونەوە لەم جیهانە تێدەپەڕێ، بۆیە ڕوالەت پێشاندەری واتاو مانایە. ڕوالەتی هەركەسەش بە شێوەی ناخو دەروونی پیشان دەدرێ. ئەم باسە ڕازێكی زۆر گەورەیە؛ بەلام لەم كتێبەدا جێگای ڕاڤەی نییە.

### بەشی هەشتەم: ڕاگەیشتن بە سەر هەڵس و كەوتەكانی خۆدا

كەسی برای! كە ئەم چوار كار بە دەستەی دەروونی خۆتت ناسی، ئاگاداری هەڵسوكەوتی خۆت بەو بزانە گوێڕایەڵی كامیانی. بە ڕاستیو دروستی كردەوەكانت بناسە؛ چونكوو هەر كردەوەیەكت ئاسەوارێک لە دلتدا بە جێ دێنێ كە هاوالو برادەرتە تا ئەو ڕۆژەی دەڕۆیتەوە بارەگای خودا. ئەم ئاسەوارە كە لە دلتدا بە جێ دەمێنێ، ئاكاری پێ دەلێن.

بە گشتی هۆی هەموو ئاكارەكانت ئەم چوارەن: ئەگەر پەرای بەرازی شاوەت كەی، لە تۆدا پیسی، زمانلووسی، دەمپیسی، دەست وشكی، بێشەرمی، چاوچنۆكیو بەخیلی بە دی دێ؛ كەچی ئەگەر بە سەریدا زال بیو بیكەیتە ژێردەستی خۆت، چاوتێری، دلاوایی، شەرم، هێمنیو پارێزكاریو پاكی لە تۆدا دیارە. هەروەها ئەگەر خزمەتی سەگی تووڕەیی بكەی، بوێریو خۆبەزلزانیو فیزو لووتبەرزیو گالتەو سووكایەتی كردن بە خەلكی لە تۆدا بە دی دێ. كەچی ئەگەر بە ئاوەژووی ئەمە بێ، واتە، سەگی توندیو تووڕەیی بێنیتە ژێر ڕكێفی خۆت، پشوودرێژیو لەسەرخۆیی، بەزەیىو

دڵۆڤانی، بوێری‌و بوردن، نەترسی‌و ئازایی‌و مێرخاسی لە دەروونتدا دێتە دی. ئەگەر شەیتانی دەروونت -کە سەگ‌و بەرازی دەروونت هەڵدەخڕێنێ و دڕندەیی‌و گزی‌و فزییان پێ فێر دەکا- بکەیتە خێوی خۆت، لە تۆدا گزی‌و فزی‌و بێ‌ئەمەگی‌و دەروون پیسی‌و خاپینۆکی[1] بە دی دێ؛ بەلام ئەگەر فریوی فێڵەکانی نەخۆی‌و لووتی بە ئاسمان نووساوی بشکێنی‌و کۆتی بەندەیی لە مل‌و لەشکری ئاوەزی بە سەردا زاڵ کەی، لە تۆدا بزێوی، وریایی، زانست‌و بەئاگایی‌و ژیری‌و ئاکار بەرزی‌و گەورەیی‌و سەربەرزی بە دی دێ. ئەم ئاکارە بەرزانەش کە دەبنە هاوالی ڕێگات، تووی بەختەوری دوارۆژتن.

ئەم کردەوانەی کە ئاکاری خراپیان لێوە بە دی دێ، سووچ‌و گوناهی پێ دەڵێن‌و ئەوەش کە دەبێتە هۆی ئاکاری بەرز، بەندەگی پێ دەڵێن. هەموو هەڵس‌وکەوتێکی مرۆڤ بریتییە لەم دوانە.

دڵ چەشنی ئاوێنەیەکی ڕووناکە؛ ئاکاری نزم‌و ناحەز، وەکوو دووکەڵێک لێی دەنیشێ‌و ڕەشی دەکا تا لە دوارۆژدا نەتوانێ سیمای پەروەردگاری خۆی ببینێ. ئەم ئاکارە بەرزانەش وەکوو ئاوێکی پاراون کە ژەنگاری دڵ دەسڕنەوە و لە گوناهپاکی دەکەنەوە؛ بۆیە پێغەمبەری خودا فەرمووی: **أتبِع السَّيِّئه الحَسَنه تُمحِها**؛ واتە: لە پاش هەر خراپەیەک، چاکەیەک بکەن تا بیسڕێتەوە.

لە ڕۆژی پەسلاندا دڵە کە دەڕواتە خزمەتی پەروەردگار؛ جا چ ڕووناک بێ یا تاریک. ڕزگار نابێ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ[2].

دڵی مرۆڤ لە سەرەتای ڕسکانەوە وەکوو ئاسنێکە کە دەکرێ ئاوێنەیەکی لێ چێ بکرێ کە هەموو عالەمی تێدا بنوێنێ؛ ئەگەر بە جوانی ڕابگیرێ. کەچی ئەگەر چاک ڕانەگیرێ، ژەنگ دەیخواو ئیدی ڕووناکی ناگرێتە خۆ. هەر وەکوو بینایی چاوان فەرمووی: كَلَّاۖ بَلْۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ[3].

## بەشی نۆهەم: ڕەچەڵەکی مرۆڤ لە وەهەری فریشتەکانە

ڕەنگە بڵێیت: کە مرۆڤ مەکۆی[4] خووی دڕندە و دێوو مەلائیک بوو، بە چ پێوەرێک ڕەچەڵەکی بوونی خووی فریشتەکان دەسەلمێنین. چۆن دەزانین کە مرۆڤ خولقاوە تا وەکوو فریشتان بژیت، نەک دڕندە و دێوو دڕنجان؟

دەبێ سەرەتا لەمە تێبگەی کە مرۆڤ بەرزترو بەڕێزترو تەواوترە تا دێو و دڕندان. هەر شتێک سەرەنجام و تەواوییەکی هەیە، کە ئامانجی سەرەکی لە خولقاندنی هەر ئەو تەواوتریەیە و بۆ ئەوە

---

١- خاپینۆک= فریودەر.

٢- (قورئان، ٨٩/٢٦) مەگین ئەوەی وەل دڵێ پاک، بچێتە بارەگای خودا (هـ).

٣ - (قورئان، ١٤/٨٣) کەواش نییە؛ بەڵکوو ئەوان ژەنگی کارەکانی خۆیان بۆتە توێژێکی سەردڵیان (هـ)

٤ - مەکۆ= جێگای کۆوە بوون.

خولقاوە.

بۆ نموونە: ئاشکرایە کە ئەسپ لە کەر بەڕێزترە؛ چونکە کاری کەر باربردنە و کاری ئەسپ ڕاکردنو بەزینە لە گۆڕەپانی خەباتو جەهادا، تا بەو چەشنەی شیاوە سواری خۆی هەڵبگرێ. هەرچەن هێزی باربردنیشی هەیە- وەکوو کەر. بەڵام بەشێکی زۆرتریشی پێ دراوە، کە بە کەر نەدراوە. بەڵام ئەگەر ئەسپێک لە ڕادەی خۆی بترازێو نەتوانێ کاری خۆی بە تەکووزی جێ بە جێ بکا، ئەوا کورتانی لە کۆڵ دەکەنو دەیهێننە ئاستی کەر- کە ئەمە شکان و سووکییە بۆ ئەسپ.

تاقمێ وای بۆ چوون، کە مرۆڤ بۆ خواردنو خەوتنو جووت بوون خولقاوە، کەواتە هەموو دەم پەرژانە سەر ئەم کارانە. تاقمێک وایانزانی بۆ ئەوە خولقاون تا بە سەر خەڵکی‌تردا گەورەیی بکەنو بە ناوی کوردو تورکو عارەب بژین. کەچی ئەم بۆچوونانە هەڵەن؛ چونکە چوارپێو گیاندارانی‌تریش ئەم بەشەیان هەیە و لەم کارەشدا چوارپێیان لە سەرووی مرۆڤن. تەنانەت جووت‌بوونی چۆلەکە زۆرتر لە هی مرۆڤە. دەی جا ئەگەر سەرتری بەمانە بێ، چۆن مرۆڤ لەمانە سەرترە؟ زاڵبوونو دەسەڵاتیش بە هۆی توندیو تووڕە بوونە، کە ئەمەش لە نێو دڕندانداا بە هێزترە. بەڵام ئادەمیزاد بێجگە لەوەی دڕندە و ئاژەڵو چوارپێ هەیانە، بەشێکی‌تریشی هەیە کە بۆتە هۆی سەدرنشینی مرۆڤ: ئەوەش ئاوەزە[1] کە پێی دراوە تا بە هۆی ئەوەوە خودانی خۆی بناسێ، لە ڕازەکانی عالەم تێبگاو بە ئاریکاری[2] ئەو خۆی لە داوی شاوەتو تووڕەیی دەرباز کاو نێڵی بەندەگییان کاتە ئەستۆ. ئەمەش تایبەتمەندی فریشتەکانە. بەم دانستانەوە بە سەر دڕندە و چوارپێیانو ئەوەی لە سەر زەوی دەژی زاڵە و هەموویان لە ژێر ڕکێفی دان. هەروەک خودای دلۆڤان فەرمووی: وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ[3]

کەواتە تێگەیشتی کە ڕاستەقینەی مرۆڤ هەر ئەوەیە بێژراو سەرتریو تەواوتریو ڕێزی ئەوەیە و دانستەکانی‌تری پێ نامۆ و سپاردەن[4]. ئەمانە بۆ پەراو یارمەتی نێردراون. بۆیە کە بەرەو جیهانی خامۆشان دەڕوا، نەتووڕەیی دەمێنێو نە شاوەت؛ بەڵکوو هەر خۆی دەڕواتو هیچی‌تر: جا یان گەوهەرێکی دانسقە و ڕووناکو ڕازاوەیە بە ناسینی خودای دلۆڤان، لە ڕواڵەتی پەریو فریشتەدا کە دەبێتە هاواڵو هاوڕێی فریشتەکان؛ ئەمەیە «**رفيق الملا الاعلى**». هەروەها هەموو دەم لە خزمەتی

---

١ - ئاوەز= ئەقل، فام.

٢- ئاریکار: یاریدەر.

٣ - (قورئان، ١٣/٤٥) هەرچی لە ناو ئاسمانەکان و زەمیندان، گش هی ئەوون (هـ)

٤ - سپاردە= ئەمانەت.

خودای خۆیانن، فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ [1]؛ یاخۆ تاریکو داماو و سەرەوخوارن: بۆیە تاریکن، زەنگاری گوناحو سووچیان لەسەر نیشتووە و بۆیە سەرەوخوارن چونکە خێیان داوەتە شاوەت و توندی. هەرچی شاوەتی بووە لەم جیهانەی بە جێهێشتووە و بۆ خۆیشی هەر ڕووی لە گراوەکەی خۆیە کە شاوەت بێو ئەوەشی لەم جیهانە بە جێ هێشتبێو ئەم جیهانەش لە خواری ئەو جیهانیترە؛ بۆیە هەردەم ڕووی لە خوارە و سەیری خوار دەکات. واتای ئەمەی کە دەڵێ: وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ [2] کەسێک کە ئەمە باری بێ دەبێتە هاواڵی شەیتان لە سججیندا؛ هەموو کەس لە واتای سججین ناگا، بۆیە کوتی: وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ [3].

**بەشی دەهەم: سەیرو سەمەرەکانی جیهانی دڵ**

سەیرو سەمەرەکانی جیهانی دڵ بێڕادەیە. بۆیە لە هەمووان سەرترە، چونکە سەیرترەو زۆربەی خەڵکی لێی بێئاگان. لە دوو بارەوە سەرترە: یەکەم بە هۆی زانستەوە؛ دووهەم بە هۆی دەسەڵاتەوە.

سەرتری دڵ لە باری زانستەوە خۆی دەبێتە دوو پاژ: یەکەم هەموو کەس دەتوانن بیناسن؛ دووهەم ئەوەیە کە شراوەیە و هەرکەس نایزانێ؛ دانسقە [4] بوونیشی هەر ئەمەیە.

بەلام ئەوەی دیارە ئەوەیە کە دڵ هێندە توانایە کە دەتوانێ هەموو زانستو پیشەکان بزانێ، ئەوی لە کتێباندا هاتووە، بیخوێنێو بیناسێ؛ وەکوو ژمێرکاریو پزیشکیو ئەستێرەناسیو زانستەکانی دین. هەرچەند یەک شتە و دابەشیش نابێ، کەچی هەمووی ئەم زانستانەی تێدا کۆوە دەبنو تەنانەت تێیدا بزر دەبن، وەکوو تۆزکاڵێک لە بیاوانێکدا. لە چاوترووکانێکا زەویو ئاسمان دەبڕێو لە ڕۆژهەلاتەوە دەڕواتە ڕۆژاوا. هەرچەند لە بەندی خاکە، کەچی هەموو ئاسمانەکان دەپێوێو تەنانەت دەزانێ ڕووبەری هەر ئەستێرەش چەندەو لە ناخی زەریاوە ماسی دێنێتە دەرو مەل لە ئاسمانەوە دەگرێو نێڵەتوون دەکاتە ملی حەیوانی دڕندە و بە هێزی وەکوو فیلو شێرو ئەسپ. بە گشتی لە هەرچی شتی زانستیو سەیرو سەمەرەیە سەردەردێنێ. ئەمانەش هەمووی بە هۆی ئەو پێنج هەستەوە کە هەیەتی بە دەست دێو چونکە هەمووان هەیانە، هەمووانیش دەیزانن.

---

١ - (قورئان، ٥٥/٥٤) لە نیشمەنی پەسند و لای خونکاری بە دەسەلات (هـ)

٢ - (قورئان، ١٢/٣٢) کاتێ تۆ تاوانبارەکان بەسەر شۆڕی ببینیەوە، کە لای پەروەرندەیانن (هـ)

٣ - (قورئان، ٨/٨٣) تۆ زانیوتە سجێن چیە؟ (هـ)

٤- دانسقە: کەم وێنە.

سەیرتر ئەوەیە کە لە دڵەوە ڕۆژنەیەک داکراوە بۆ عالەمی سەروو، هەروەک چۆن لە لەشدا پێنج دەلاقە داکراوە بۆ ناسینی ئەم جیهانە، کە جیهانی جیسمانی پێ دەڵێنو عالەمی سەرووش بە جیهانی ڕۆحانی دەناسرێ. زوربەی خەڵکی، عالەمی جیسمانی دەناسنو پێیان وایە ڕێگای زانستیش هەر ئەمەیە؛ کەچی ئەم عالەمە گەلێک کورتو بێبایەخو بێبنەمایە.

بەڵگەش بۆ ئەم وتەیە کە لە دڵەوە ڕۆژنەیەکیتر هەیە بۆ ناسین دوو شتە:

یەکەم خەونە: کە هەستەکانیتر دەڕۆنە خەونو پشوو دەدەن، لە ناخەوە دەلاقەیەک ئاوەڵا دەبێ کە هەندێ لەو شتانەی لە عالەمی سەروو و لە لەوحی پارێزراو دان، پیشان دەدا، هەندێ ڕووداوی داهاتوو دەنوێنێ؛ جا یا بە ڕاشکاوی، هەر بەو چەشنەی کە ڕوو دەدا؛ یاخۆ لە پەردەدا دێ کە پێویستی بە شرۆڤەیە[1].

هەروەک خویانە[2] خەڵکی لایان وایە ئەوی بە خەبەر بێ، باشتر دەناسێو باشتر دەزانێ، کەچی دەبینن لە بێداریدا جیهانی شاراوە نابینن، بەلام لە خەوندا دەڕۆنە سەیری ئەو جیهانە.

ئەم کتێبە جێگای ئەوە نییە بە وردی ڕاستەقینەی خەون وەرد بدرێتەوە، بەلام هەر ئەمە دەڵێم کە دڵ وەکوو ئاوێنەیە و لەوحی پارێزراویش وەکوو ئاوێنەیەک کە ڕوومەتی هەموو بوونەوەرانی تێدایە. کاتێک دڵ پاقژ کراوە و لە هەرچی پیسییە پاک بۆوە و هەستەکانیش هەموو نووستن، ئەوسا چۆن کە دوو ئاوێنە لە هەمبەر یەک ڕابگرین ئەو ڕوومەتانەی لە یەکێکیاندایە دەکەوێتە نێو ئەویتر، ئەوەش کە لەنێو لەوحی پارێزراو دایە، ڕەنگ دەداتەوە نێو ئاوێنەی دڵ. مرۆ تا بپەرژێتە سەر هەست پێکراوان (مەحسووسات) لە سەیری عالەمی سەروو بەری دەبێ، کەچی کاتێک هەستەکانی نووستن، ئەوی لە گەوهەری وی دایە دەڕواتە سەیری عالەمی سەروو. کاتی نووستن، هەرچەند هەستەکان دەخەون، بەلام خەیاڵ بێدارو لەسەر خۆیە. بۆیە هەرچی دەبینێ وەکوو خەیاڵێک دێتە پێش چاوی: ڕوونو ئاشکرا نییە و ڕووبەندی لە سەر لانەبراوە. بەلام کە مرد نە خەیاڵو نە هەستەکان نامێنن، جا ئەو دەم بێ پەردە هەموو کارەکان دەبینێ؛ بۆیە فەرمووی: فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ یاخۆ: أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا [3].

بەڵگەی **دووهەم** ئەوەیە کە زۆربەی خەڵکی هەندێ جار زانیاری یاخۆ بیرەوەرییەک لە دڵی خۆدا هەست پێ دەکەن کە لە سۆنگەی هەستەکانیانەوە نەیانناسیوە، بەڵکوو لە ناخی دڵیانەوە هەڵقوڵیوەو

---

١- شرۆڤە: لێکدانەوە.

٢- ئاشکرایە.

٣ - (قورئان، ١٢/٣٢) دیتمان و بیستمان؛ ماتۆ بمانگەڕێنەوە؛ ئەمجارە کاری چاک دەکەین (هـ).

بۆ خۆشیان لە هۆکارەکەی تێناگەن. هەر بەم بەڵگەیە دەزانی کە زانستەکان هەموویان بە هۆی هەستەکانەوە بە دەست نایەن‌و دڵیش لەم جیهانە نییە و هی جیهانی سەرووە. هەروەها تێدەگەی کە هەستەکان کە بۆ دیتنەوەی ڕێگاو کونجو بناوانی ئەم جیهانە خولقاون، خۆیان پەردەن لە بۆ دیتنی جیهانی سەروو؛ تا خۆت لێیان دەرباز نەکەی ڕێگە نابەیتە ئەوێ.

## بەشی یازدەهەم: پێوەندی دڵ دەگەڵ جیهانی سەروو

پێت وانەبێ ڕۆچنەی[1] دڵ بەرەو جیهانی سەروو، بێجگە لە خەون ومردن، دانـاکرێ. بەڵکوو ئەگەر مرۆڤ، لە بێداریدا چاودێری دڵی خۆی کا و لە پەنجەی تووڕەیی و شاوەت و ئاکاری نـزم و چرووکـی ئەم جیهانەی دەرباز بکا و بە تاقی تەنێ، لە کونجێکدا دانیشێ و چاو بنووقێنێ و ئاگـای لـە هەسـت و نستی ببڕێ و دڵ بە جیهانی سەرووەوە گرێ بدا، بـە گـوتنی زیکـری **«الله»** **«الله»** -بە دڵ نـەک زمان- تا ئاگای لە خۆی ببڕێ و بێجگـە لـە خـوا هیچـیدی نەناسـێ؛ کـە وای کـرد، ڕۆژنـەی دڵـی دەکرێتەوە و ئەوەی خەڵکی لە خەوندا دەیبینن، لە بێداریدا سەیری دەکـا؛ فریـشتەکان لـە ڕواڵـەتی خوشیک و جوان، خویان دەبن؛ دەگاتە خزمەت پێغەمبەران و بەهرەیان لێ دەبـا و یاریـدەی دەدەن؛ بەگشتی سەر و بەری جیهانی پێ پیشان دەدرێ.

ئەوەی ئەم ڕێگای بۆ بکرێتەوە، زۆر کاری گەورەی لە وتن‌نەهاتگی بۆ ئاشکرا دەبێ. ئەوەی کە پێغەمبەر فەرمووی: «زُوِيَتْ لِي الأرْضَ فأريتُ مشارقها و مغاربها»[2]، و ئەوەش کە خودا فەرمووی: وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ[3] بۆ ڕاڤەی ئەم دۆخەن؛ تەنانەت سەرلەبەری زانستی پێغەمبەران، لەم ڕێوە بووە نەک بە هۆی هەستەکانیانەوە. هەروەک پەروەردگار دەفەرمێ: «و اذکر اسم ربّک و تبتّل الیه تبتیلاً»[4]، لە هەموو شت دابڕە و هەموو شت پێشکەشی ئەو کە و مەپەرژێرە سەر کاری دونیا، خودێ خۆی کاری دونیات پێکدێنێ؛ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا[5] کە خودات کردە بریکاری خۆت، ئاسوودە بە و لە خەڵک دابڕە؛ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا

---

١- ڕۆچنە: ڕۆژنە.

٢- زەوین لە پێش چاوم ئامادە بوو و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوایم بە تەواوی دی.

٣- (قورئان ٧٥/٦) هەر ئەو دەمەش بوو کە ئێمە نیشانی ئیبراهیممان دا دام و دەزگای ئەم عاسمان و زەمینە سەر بـە کێیـە، تـا لـە ڕیزی باوەڕدارە ڕاستەکان بێ. (هـ)

٤- قورئان (٧٣/٨) هەر ناوی پەروەرندەی خۆت بە یادکە و لە غەیرەز ئەو، لە هەموو شت بتەکەوە. (ه)

٥- قورئان (٧٣/٩) پەروەرێنی خۆرهەڵات و خۆرئاوایە؛ بە غەیرەز ئەو هیچ شت بۆ پەرستن نابێ، هەر ئەو بە بریکار بگرە. (هـ)

يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرًا جَمِيلاً[1]. ئەمە هەمووی فێرکردنی کۆشەوە و هاندانە بۆ پاک و خاوێن کردنەوەی دڵ لە شەڕی خەڵک و شاوەتی دونیا و گێچەڵی هەستەکان؛ ئەمەیە ڕێی سۆفییەکان و هەرئەمش ڕێی پێغەمبەرانە.

کۆ کردنەوەی زانست بە خوێندن و فێرکاری، کاری زانایانە. ئەمـەش گـەورە و پڕبایەخـە؛ بـەڵام لـە ئاست زانستی پێغەمبەران و سۆفییان -کە بێ ناوبژیوان لە کانی زانستی خـودا بـەهرە دەبـەن- هـەر هیچ نییە. ڕاستی و دروستی ئەم ڕێبازە هەم بەڵگەی هزری و هەم بە ئەزموون، بـۆ هـەموان خویـان بووە. ئەگەر بە ئەزموون پێت نەسەلمێندراوە و بە فێرکـردنیش ڕانـەهاتووی و بەڵـگەی هزریـشت پـێ نەنوێندراوە، کەمترینی ئەوەیە بڕوات بەم ڕاستییە هەبێ و دانیپێدا نی، تا لە هەر سێکی ئـەم قۆناغانـە بێوەر نەبی و نەبیتـە کـافر. ئەمـەش لـە سـەیر و سـەمەرەکانی جیهـانی دڵـە و بەمـەوە سـەرتری و شەرەفی دڵی مرۆ خویان دەبێ.

## بەشی دوازدەهەم: مرۆڤ لە سەر فیترەتی دێتە دونیا

واتێنەگەی گەوهەری پێغەمبەران هەر لە سەرەتاوە بۆ پێغەمبەری خولقاوە، بەڵکوو هـەموو مرۆڤـێک لە سەرەتای هاتنەدیدا شیاوی پێغەمبەرییە. هەر وەکوو چۆن هیچ ئاسنێک نییە کە لـە نـاخی خۆیـدا شیاوی ئەوە نەبێ ئاوێنەی لێ چێ بکەن، مەگەر ئەوەی ژەنـگ ڕۆچووبێتـە ناخیـەوە و فەوتانـدبێتی. هەروەها هەر دڵێک کە خۆشەویـستی دونیـاو کۆکردنـەوەی مـاڵو سـامان تەشـەنەی تێـدا کردبـێو جێگایەکی بۆشی تێدا نەهێشتبێتەوە، ئەو دڵەش لە گەیشتن بەو پلە و پێگەیە بێوەرە: «وَكُلُّ مَولـود يولد على فِطرة فَأَبواهُ يُهَوِّدانه وِ يُنَصِّرانه و يُمَجِّسانه[2]». خوداش بە ناردنی ئەم ئایەتە، خـەڵـک و خـوای لەم ڕاستییە ئاگەدار کردەوەو فەرمووی أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ[3]. هەر وەکوو چۆن هەموو بیرمەندێ کـە پێی بڵێن «دوو لە یەک زۆرترە»، بـەبـێ ڕامـان دەڵـێ: ڕاسـتە و دوو زۆرتـر لـە یەکـە و ڕەنگـە ئـەم قسەیەش بە زار نەڵێ، کەچی هەموو گیانی شایەتی بـەم ڕاسـتییە دەدەنو لـە ڕاسـت بوونیـدا هـیچ دڕدۆنگ نـابن؛ ناسـینی پەروەرێنـەریش فیترییـە. هـەروەک خـودا فـەرمووی: وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ

---

١- (قورئان، ٧٣/ ١٠) بۆ ئەو قسانەش کە ئەیکەن، خۆڕاگر بە! لێشیان لادە؛ بەلادانێکی پەسند.

٢ - هەر مرۆڤێک لە سەر فیترەتی -واتە ئیسلام- دێتە دونیاوە، پاشان دایک و بابی دەیکەنە جوولەکە و فەلە.

٣ - (قورئان، ٧/١٧٢) من پەروەرندەی ئێوەم؟ گوتیان: بەڵێ.

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ[1]. هـەروەها کـوتی: فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَا[2] چ بـە بەڵـگەی عەقڵیو چ بە ئەزموون سەلمێندرا کە ئەمە تایبـەت بـە پێغەمبـەران نییـە، چونکـە پێغەمبـەرەکانیش مرۆڤن: قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ[3].

بەلام ئەگەر کەسێک ئەم ڕێگایەی بۆ ئاوەڵا کراو ڕێگای بەختەوەری خەڵکیشی پێ پیـشان دراو بـۆ گرتنە ئەستۆی ئەم ئەرکە بانگێشتن کرا، ئەوەی پێیـدراوە «شـەریعەت»ی پـێ دەڵـێنو بـە خۆشـی دەڵێن پێغەمبەرو بە ئەحواڵیشی دەڵێن پەرجوو[4]. کاتێک پەرژایە سەر ڕێنومایی خەڵک، پێی دەڵـێن «وەلی»و بە حالاتی دەڵێن «کەرامات». مەرجیش نییە هەرکەس ئەم ئەحواڵـەی هـەبێ بانگێـشتنی خەڵکی بکات، بەڵکوو ئەمە لە دەسەڵاتی خودایە کە بینێرێ بۆ ڕێنومایی خەڵک یا نـە: جـا یـا هـۆی ئەوەی کە پێغەمبەرێکیتر بۆ ڕێنومایی نێردراوەو پێویـست بـە نـاردنی ئـەم نییـە، یـاخۆ هـەموو ئـەو مەرجانەی شیاوی پێغەمبەرین لەم وەلییەدا کۆ نەکراون.

کەواتە دەبێ بڕوایەکی پتەوت هەبێ بە جێنشینی و گـەورەیی ئـەولیاو دەبـێ ئەمـەش بـزانی کـە سـەرەتای ئەم کارەش کۆشەوە و تەقالایە و لەم قۆناغەدا ڕێبـوار ئـازادە؛ بـەلام مـەرج نییـە هەرکـەس تووی چاند، خەرمان هەڵگرێو هەرکـەس ڕۆیـشت بگـاتو هەرکەسـیش گـەڕا ببینێتـەوە. خویانـە، ئەوەی هێژاتر بێ، دیتنەوەی دژوارترو دەگمـەنترە؛ ئەمـەش سـەرترینو بـەرزترین ئاسـتی مرۆڤـە لـە مەقامی ناسیندا. مەرجی گەیشتن بەم ئاستەش تەقالای زۆرو ڕێنومایی پیرێکی ڕێـزانو کارزانـە. کـە ئـەم دوو مەرجـەی بـوو، تـا خـودا یارمـەتی نـەداو تـاکوو لـە چارەیـدا نەنووسـرابێت، ناگاتـە ئـەم پاگەیە.گەیشتن بە پلەی ڕێبەرایەتیش لە زانـستەکانی ڕواڵـەتو لـە هـەموو کـارە ئیرادییـەکانیـشدا هەروایە.

## بەشی سێزدەهەم: شەرەفی دڵ بە هۆی هێزەوە

چون لە باری ناسینەوە، چەن شتێکت لە دڵ بیستو زانیـت، دەبـێ ئەمـەش بزانـی لـە ڕەهەنـدی هێزیشەوە دانستەیەکی هەیە کە تایبەتی فریشتەکانەو گیاندارانیتر نیانە. ئەوەش ئەمەیە هـەر وەکـوو چۆن هەموو عالەم بە ئیزنی خودا لە ژێر ڕکێفـی فرشـتەکانەو -بـۆ نموونـە- کاتێـک بـە ئیزنـی خـوا پێویست بوو، باران دادەبارێننە سەر زەوی، دەبنـە هـۆی شـنیانی بـاو ئـاژەڵان لـە پـزدانی دایکیـانو

---

١ - (قورئان، ٢٥/٣١) گەر لێیان بپرسی کێیە ئاسمانەکان و زەوی ئافراند، دەڵێن ئەللا.

٢ - (قورئان، ٣٠/٣٠) لە سروشتا خوا ئەو خەڵکەی هەر بۆ یەکتاپەرسی وەدی هیناوە (هـ)

٣ - (قورئان، ١٨/١١٠) بلێ منیش مرۆڤێکم وەکوو ئێوە.

٤ - پەرجوو- موعجیزە.

ڕووەکیش لە دڵی زەویدا دەڕسکێنن‌و دەڕازێننەوە و بۆ هەر دەستە لەم کارانەش تاقمێک لە فریشتەکان ڕاسپێردراون، دڵی مرۆڤیش -کە لە ماکی فریشتەکانە- دەسەڵاتێکی پێدراوە تا هەندێ لە شتی ئەم عالەمە بێنێتە ژێر ڕکێفی خۆی.

جیهانی تایبەتی هەر کەسێک لەشی ویبە. لەشیش گوێ لە مستی دڵە. دیارە نە دڵ‌و نە زانستی دڵ لە ئەنگوستدا نییە، کەچی کاتێ دڵ ئەمر کا، ئەنگوست دەبزوێ؛ کاتێک کە دڵ تووڕە دەبێ، ئارەقە لە حەفت ئەندامی لەش دێتە دەر(ئەمەش وەکوو بارانە)؛ کاتێک شاوەتی بێ، شەرمگا دەبزوێنێ‌و کاتێ بیر لە خواردن بکاتەوە و خەریکی خواردن بێ، ئاوی زار بەر دەبێتەوە سەر خواردن‌و بە جۆرێک دەیخووسێنێ شیاوی خواردن بێ.

ئاشکرایە دەسەلاتی دڵ بە سەر لەشدا لە سۆنگەی گیانەوەیە. لەشیش لە ژێر ڕکێفی دلایە؛ بەلام دەبێ ئەمەش بزانین تاقمێ لە دڵەکان، چونکە بەهێزترو هێژاترن، زۆرتر لە گەوهەری فریشتەکان دەچن و بەم بۆنەوە دەتوانن بە سەر هەندێ شت لە دەرەوەی لەشیشدا دەسەلاتیان هەبێ: بۆ نموونە، کە دەسەلاتی دەکەوێتە سەر شێرێکی دڕندە، لە هەمبەرێدا وەکوو پشیلەیەک سەر دەخەوێنێ؛ یا خۆ بیر لە نەخۆشییەک دەکاتەوە، چاک دەبێتەوە؛ یا بە پێچەوانە کە بیر لە لەش ساغییەک دەکاتەوە نەخۆشی دەخا؛ یاخۆ کاتێک بیر لە کەسێک دەکاتەوە، بە سەر دڵی ئەو کەسەدا کاریگەر دەبێ‌و تەلی گیانی دەبزوێنێ؛ یا کاتێک بیر لە باران دەکاتەوە، باران دەبارێ.

ئەمانە هەمووی هەم بە بەڵگەی عەقڵی‌و هەمیش بە ئەزموون تاقی کراونەتەوە. ئەوەش کە پێی دەڵێن چاوی پیسە، یا سیحربازە، ئەویش هەر لەم جۆرەیە و لە دەستەی کاریگەری گیانی مرۆڤە بە سەر شتەکانی‌تردا: بۆ وێنە، ئەوەی بەخیل‌و چاوچنۆک‌و نەگریس بێ، کاتێک چارەوایەکی جوان دەبینێ، بە هۆی چاوچنۆکیوە ئاواتی مردارەوە کردنی دەخوازێ‌و ئەو گیاندارەش دەمرێ. هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «اَلعَینُ الحَقّ؛ العَینُ تُدخِلُ الرَّجُلَ القَبرَ و الجَمَلَ القِدرَ[1]».

ئەمەش لە سەیرو سەمەرەکانی دڵە. کە ئەم هێزە لە کەسێکدا هاتە دی، ئەگەر خەڵکی بەرەو لای خوا بانگێشتن دەکرد، ئەوە «پەرجۆ»ی پێ دەڵێن؛ ئەگەریش نە، کەراماتی پێ دەڵێن. ئەگەر لە کاری چاکەدا بێ، پێی دەڵێن نەبی یا وەلی، ئەگەریش لە کاری خراپەدا بوو، پێی دەڵێن سیحرباز.

کەواتە سیحرو کیرامات‌و پەرجۆ، هەموو لە تایبەتمەندییەکانی دڵن، هەرچەن گەلێک لێک جیاوازن. ئەم کتێبە لەمە زۆرتر ڕێگا بە درێژەی ئەم باسە نادات.

---

١- چاوی پیس ڕاستە؛ پیاو دەخاتە نێو قەبر و حوشتر دەخانە نێو قازان.

**بەشی چواردەهەم: ڕاستەقینەی پێغەمبەری و جێنشینی**

ئەگەر کەسێک لەمەی بێژرا تێنەگا، لە ڕاستەقینەی پێغەمبەرایەتی هیچ تێنەگەیشتووە بێجگە لەوەی چەن شتەکی بیستووە؛ چونکە پێغەمبەرو وەلی بوون، لە پلە و پاگەکانی شان و شکۆی دڵی مرۆیە و بەرهەمیشی سێ دانستەیە: خەڵکی لە خەونیدا پەردەی لە سەر دڵ لادەدرێ، ئەوان لە بێداریدا؛ دووەم، نەفەسی خەڵکی بە تەنیا لە نێو لەشی خۆیاندا کاریگەرە، کەچی ودمی[1] ئەوان لە گیاندارو بێگیاندا کاریگەرە، بە چەشنێک کە بەربەستی زیان دەبێ و خێرو چاکەیان بۆ دێنێ؛ ئەو زانستەی خەڵکی بە فێرکاری فێری دەبن، ئەوان بەبێ فێرکاری شارەزای دەبن. ئەم زانستەش، زانستی «لەدونی» (لَدُنی) پێ دەبێژن؛ هەروەک خودا فەرمووی:وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا[2].

هەرکەسەی ئەم سێ تایبەتمەندییەی لە دڵدا کۆوە بن، لە پێغەمبەرانی بەڕێز یاخۆ لە ڕیزی ئەولیای گەورەیە. ئەگەر بە تەنیا یەک لەم دانستانەشی لە دڵدا هەبوو، دیسان بە هەمان چەشنە. لە هەر یەکەشدا گەلێک جیاوازی هەیە؛ ئی وا هەیە لە هەر تایبەتمەندیدا نەختێکی هەیە و ئی واش هەیە زۆری هەیە.

بەرزی پێغەمبەری ئێمە لەوەدا بوو کە ئەم سێ دانستەی بە تەواوی هەبوو. خودای گەورەش کە ویستی کەسێک بگەیەنێتە پاگەی پێغەمبەری، تا خەڵکی گوێی بۆ شل کەن و بۆ گەیشتن بە بەختەوەری دوارۆژ بکەونە دووی، لەم سێ دانستەیە، هەر یەکە و بەشێکی پێ دا: خەون، نوێنەری یەک دانستەیە، ژیری و وریایی نوێنەری تایبەتمەندی دووەمە و گەیشتن بە ڕاسەقینە لە زانستدا نوێنەری سێهەمینیانە.

مرۆ، قەد بروا بە شتێک ناهێنێ کە هاوڕەگەزی وی نەبێ؛ کە هەر شتەک لە خۆیدا بە دی نەکات، لە واتای ئەو شتەش تێناگا. بۆیە کەس لە ڕاستەقینەی پەروەردگار ناگا، مەگین خودا خۆی. ڕاڤەی ئەم ڕاستەقینەیە زۆر دەبا؛ لە کتێبی «واتای ناوەکانی خودا»دا ڕوونم کردۆتەوە. مەبەست ئەوەیە ئێستا کە تێگەیشتین بێجگە لەم سێ دانستەیە، پێغەمبەران و دۆستانی خوا تایبەتمەندیتریان هەیە کە ئێمە لێی بێئاگاین؛ چونکە هەستی پێ ناکەین. کەواتە هەر وەکوو دەڵێین بێجگە لە خوا، کەس خوا ناناسێ، ئەمەش دەڵێین کە کەس بە تەواوی پێغەمبەر ناناسێ، مەگین خۆی و ئەوی لەو سەرترە. کەواتە لە نێو مرۆڤیشدا ئەوانەی لە ئاستی پێغەمبەرانن، دەتوانن پێغەمبەران بناسن. ئێمەش زۆرتر لەمەی بێژرا، نازانین؛ هەر وەکوو ئەگەر خەون نەبوایە و کەسێک پێمانی بگوتایە: «کەسێک هەیە کە

---

[1]- ودمی: ممبارەک، پیرۆز.

[2] - (قورئان، ١٨/٦٥) زانیاریشمان لەخۆمانەوە پێدا بوو. (هـ)

لە جێگا کەوتووە و هیچ نابزوێ‌و نابینێ‌و نابیسێ، کەچی دەزانێ بەیانی چ دەقـەومـێ»، دیـارە ئەگـەر کەسێک هەم ببینێ‌و هەمیش ببیسێ، دیسان بڕوا هێنان بەم قسەیە ئەستەمە، چ بگـا بەمـەی بێـژرا. مرۆ ئەوەی نەیدیبێ، بڕواشی پێ ناهێنێ. بۆیە پەروەردگار فـەرمووی: بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ[1]. هەروەها فەرمووی: وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ[2].

پێت سەیر نەبێ ئەگەر پێغەمبەران‌و چاکانی خوا هەنـدێ تایبەتمەنـدییان بـێ‌و کـەس ئاگـای لـێ نەبێ. ئەوانیش لەو دانستانە چێژو حەزی بەرز دەبەن؛ دەبینی ئەگەر کەسێک لە شیعر تێنـەگاو هـیچ چێژێک لە کێشی شیعر نەبا، کەس ناتوانێ لەو خۆشییەی تێ‌بگەینێ؛ چونکوو ئەو کەسە لە بنچینـە و بناوانی شیعر نازانێ. هەروایە ئەوەی زک‌ماک نەبینێ، هیچ بەهرەیەک لە خۆشی ڕەنگـی جـوان نابـا. کەواتە سەرت لـە دەسـەڵاتی پـەروەردگارت سـووڕ نـەمێنێ، ئەگـەر هەنـدێ لـە هەسـتەکان، پـاش گەیشتن بە پێغەمبەری بەدی‌دێنێ‌و پێش ئەوە کەس لێی بە ئاگا نییە.

## بەشی پانزدەهەم: پەردەی ڕێگا

لەمەی بێژرا، تێگەیشتی کە گەورەیی گەوهەری مرۆ چەندەو ڕێگای سۆفییان چۆنـە. گـەلێک جـار بیستووتە لە سۆفیان کە وتوویانە: «زانست پەردەی ڕێگایە»و بۆتیش قووت نـەچووە. ئـەم قـسەیە بـە درۆ مەزانە؛ چونکە ڕاستە. چونکە لە بەرهەستەکان و هەر زانستێک کە بەم هۆی ئەم بـەرهـەسـتانەوە بیانزانی، کاتێک دەپەرژێتە سەری و تێیدا نوقم دەبی، ئەمە دەبێتە پەردەی ڕێگات.

دڵ وەکوو گۆمێکە و پێنج هەستیش وەکوو پێنج جۆگە کە لە دەرەوە دەڕژێنـە نێـو ئـەم گۆمـەوە. ئەگەر بتەوێ ئاوێکی پاک‌و ڕوون لە بنی ئەستێرێکەوە هەڵقوڵێ، دەبـێ سـەرەتا ئـاوی تێـدا نەهێـڵی، ئینجا لە لمو لینجی ڕەشی بن گۆم -کە ئاسەواری ئاوەکەیە- بیسرییەوە، پاشان جۆگـەکانی بـە سـەردا ببەستی تا ئاوی پێ نەگا؛ پاشان ئەوەندە بنی گۆم هەڵکۆڵی تا بگات بە ئاوی ڕوون. تـا ئـەو دەمـە بـە هۆی جۆگەکانەوە ئاو بێتە نێو ئەم گۆمە، نابـێ چـاوەڕوان بـین لـە بنـەوە ئـاو دەربـێ. هەروایـە ئـەم زانستەش لە دڵەوە هەڵناقوڵێ، مەگین ئەوەی هەرچی لە دەرەوە دێ، بەری بگیرێ.

بەڵام زانا ئەگەر لەوەی خوێندوویە خۆی بۆش کاتەوە و دڵی پێ نەدا، ئـەو زانـستە نابێتـە پـەردەی ڕێگا؛ تەنانەت ڕەنگە ببێتە هۆی سەرکەوتنی. هەر وەکوو چۆن کە داڵغە و هەستەکان لـە دڵ بـسڕێ،

---

[1] - (قورئان، ۳۹/۱۰) نەخێر ئەوان شتێک بەدرۆ دەزانن، کە هیچی لێ تێ نەگەیون و بۆشیان لێک نەدراوەتەوە. (هـ)

[2] - (قورئان، ۱۱/٤٦) ئێستا کە نەیگەیشتوونێ، ئێژن ئەمە درۆیەکی کەونارایە. (هـ)

نابنە پەردەی ڕێگای. هۆی ئەوەی زانست دەبێتە پەردەی ڕێگا، ئەوەیە کە چۆن کەسێک بیرو ڕاکانی ئەهلی سوننە فێر دەبێ‌و دێتە سەر ئەم ڕایە کە بێجگە لەوەی خوێندوویە، هەرچی هەیە و هەرچی بێژراوە هەڵەیە و ڕاستی تەنیا لە لای ئەمە و هیچی‌تر، دیارە ئاوەها کەسێک قەد ڕێگە ناباتە سەر ڕاستی؛ چونکە ئەوەی ئەمانە فێری خەڵکی دەکەن، توێکڵی ڕاستەقینەیە، نەک کاکڵی؛ زانینی بە ڕاست ئەوەیە کە ئەوی لە نێو ئەم توێکڵەیە، دەربهاوێژرێ‌و ئاشکرا بکرێ.

ئەمەش بزانە کەسێک کە ڕێگای شەڕە قسە بۆ داسەپاندنی بروای بگرێتە بەر، قەد ڕاستەقینەی لێ خویان نابێ. چونکە پێی وایە ڕاستی هەر ئەوەیە ئەم دەیزانێ، قەد ڕاستەڕێ نابینێتەوە و ئەم کۆسپەی لە بەر لاناچێ. ئەو کەسانەی ئاوا بیر کەنەوە، زۆرتر لە تاریکی دەژین‌و ڕێگایان بزرکردووە؛ ئەمانە تاقمێکن پێیان دەڵێن جەدەلی.

کەچی ئەگەر کەسێک لەم بیرە دەرباز بوو، زانست نابێتە پەردەی ڕێگای. بەڵکوو کە ئەم سەرکەوتنەی دەست کەوت، دەگاتە ئەوپەڕی بەرزی و ڕێگاشی هێمنترو ڕاستتر دەبێ؛ چونکە ئەوەی پێشتر لە زانستدا ڕۆ نەچووبێ‌و تێرئاو نەبووبێ، دالغەیەک دەبێتە هۆی سەرلێشێوان‌و ڕێگا بزر کردنی. بەڵام زانایان لەم مەترسی بێوەرین.

کەواتە کاتێک کە لە کەسێکی بە ڕادەی موکاشیفە گەیشتووت بیست کە«زانست پەردەیە»، دەبێ لە واتاکەی تێبگەی‌و دانی پێدا بنێ.

بەڵام ئەم «ئەباحەتییە»[1] بێ‌کەڵکانە کە قەد لەم ئاستەدا نەبوون‌و بە تەنیا چەن پەیڤێکیان لە سۆفییەکان وەرگرتووەو کاوێژی دەکەن‌و کاریان هەر ئەوەیە کە هەموو ڕۆژێ خۆیان دەشۆن‌و بەرماڵ لە کۆڵ‌و تەسبێح لە دەست، دێنە نێو خەڵک‌و جنێو بە زانست‌و زانایان دەدەن. ئەمانە شیاوی کوژرانن‌و شەیتانی نێو کۆمەڵ‌و دوژمنی خوداو پێغەمبەری وین. چونکە خوداو پێغەمبەری پەسنی زانست‌و زانایانیان کردووە و خەڵکیان هان داوە بۆ وەی فێری زانین بن.

جا کەسی خۆم! چۆن کەسێک کە نە لە ڕێگای خودا تێگەیشتبێ و نە لە زانست، بۆی هەیە ئاوا بدوێ؟ ئەمە حاڵی ئەو کەسەیە کە بیستبێتی کیمیا لە زێڕ باشترە، چونکە لە کیمیا بێ ڕادە زێڕ چێ دەبێ. جا ئەو کەسە زێڕێکی زۆری پێ بدەن و ئەویش وەرینەگرێ و بڵێ: «کەڵکو بایەخی زێڕ چییە؟ کیمیا باشترە کە سەرچاوەی زێڕە»، زێڕەکە وەرنەگرێ و قەدیش کیمیا نەبینێ. داماو برسی‌و دەستبەتاڵ بمێنێ و هەر خەریکی هەڵپەرکێ و خۆشی بێ و بڵێ وتوومە کیمیا لە زێڕ باشترە.

---

[1]- ئەباحەتی، کەسانێکن کە گوێ بە داب و دەستوور و ئەرکەکانی شەریعەت نادەن و لایان وایە ئەوانەی لە ڕاستەقینە گەیشتوون، پێویست ناکا گەردن بۆ دەستوورەکانی شەرع کەچ کەن.

کەواتە کەشفی پێغەمبەران‌و چاکان وەکوو کیمیایە و زانستی زانایان وەکوو زێڕ. بە گشتی خێوی[1] کیمیا سەرتر لە خێوی زێڕە. بەلام خاڵێک لێرەدایە، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر کەسێک ئەوەندە کیمیای هەبێ کە بتوانێ سەد دیناری پێ چێ بکا، کەمتر لەو کەسەیە کە هەزار دیناری هەیە.

هەر وەکوو چۆن کتێب و باسی کیمیا زۆرە و پاش دەیان ساڵیش گەیشتن پێی ئەستەمە و زۆربەی ئەوانەی بە دوویا وێڵن، بەرهەمەکەیان قەڵبە، کاری سۆفیش هەروایە: بە دەگمەن کەسێک ئەو ڕێگا دەبینێتەوە؛ ئەوانەش کە دەگەنە ئەو مەنزڵگایە، زۆر کەمن.

کەواتە، دەبێ بزانی، هەر کەس تۆزکاڵێک لە ئەحواڵی سۆفییەکانی پێ گەیشت، لە زانایان سەرتر نییە؛ چونکە زۆربەیان لە سەرەتای ڕێگادا هەندێ شتیان پێ پیشان دەدرێ، بەلام لێیان بزر دەبێ و ناگەنە تەواوتری. کەچی پێی وایە هەمووی هەر ئەوەیە؛ جا لە دە، نۆیان هەروان. هەر وەکوو چۆن هەم خەونی ڕاست هەیە و هەمیش خەونی پووچەڵ. سۆفییەک لە زانایان سەرترە کە لە حاڵی خۆیدا تەواو بێ‌و هەر زانستێک کە زانایان بە فێرکاری، فێری بوون، ئەم بۆخۆی فێری بووبێ؛ ئەمەش زۆر بە دەگمەن دەست دەکەوێ. کەواتە دەبێ بە بنچینەی ڕێگای تەسەووف‌و سەرتریان باوەڕت هەبێ‌و بەبۆنەی کولکە سۆفیانەوە بڕوات نەفەوتێنێ. هەروەها هەر یەک لە وانەی کە پلار دەگرێنە زانست‌و زانایانت بەرچاو کەوت، بزانە هیچ تێنەگەیشتوون.

## بەشی شانزدەهەم: بەختەوەری مرۆڤ لە ناسینی پەروەردگارایە

ئەگەر دەڵێی لە کوێڕا دەزانین کە بەختەوەری مرۆ لە ناسینی خێوی خۆیە، بەوە بزانە کە بەختەوەری هەر شتەک لە چێژو خۆشی ئەو شتەدایە. خۆشی هەر شتێش لەوەدایە کە بە گوێرەی تەبعی ئەو شتە بێ. تەبعی هەر شتێش هۆی ئافراندنی ئەو شتەیە. هەر وەکوو چێژی جووت بوون لەوە دایە کە بە کامی خۆی بگا، چێژی تووڕەیی لە ئازاری دوژمندایە؛ چێژی چاو، لە دیتنی ڕوومەتی جوانایە؛ گوێش بە بیستنی دەنگی خۆش دەبووژێتەوە. هەروەها خۆشی دڵیش لە گەیشتن بە هۆی ڕسکانیدایە؛ ئەویش ناسینی ڕاستەقینەی هەر شتە، چونکە ئەمە دانستەی دڵی مرۆیە. بەلام شاوەت‌و تووڕەیی‌و پێنج هەستەکان، ئاژەڵیش هەیانە.

بەم بۆنەوە مرۆڤ مەیلی گەڕان بە دووی نەزانراوەکانی لە دڵدا دانراوە، تا بۆیان بگەڕێ‌و بیانزانێ. شانازی بەوەی دەیزانێ دەکاو پێی شادو شوکور دەبێ، هەرچەند شتێکی بچووکی بێ‌بایەخیش بێ؛ وەکوو ئەو کەسەی شارەزای شەترەنج بێ‌و لە نێوان یاری دوو کەسدا پێی بڵێن هیچ مەڵێ. جا

---

[1] - خێو: خاوەن، ساحێب.

ئەویش لەوەی کە چەندە شارەزای یارییە گەلێک شانازی بە خۆ دەکاو زۆریش حەز دەکا بۆ نواندنی توانی خۆ ڕێنومایی لایەنێک بکا.

کاتێک زانیت چێژی دڵ لە ناسینی کارەکانایە، ئەمەش بزانی هەرچەند کە ئەو شتەی دەناسرێ گەورەترو سەرتر بێ، خۆشییەکەشی زۆرترە. ئەوەی لە نهێنیەکانی وەزیر بە خەبەر بێ، پێی شاد دەبێ؛ ئەگەر لە بیری پادشا بە ئاگا بێ‌و ڕاکانی باش بزانێ، زۆرتر چێژی لێ دەبا. ئەوەی زانستی هیندسە و ئەستێرەناسی بە تەکووزی بزانێ، زۆرتر لەو کەسەی بە تەنیا شەترەنج دەزانێ، شادو شوکور دەبێ. ئەوەش کە باش دەزانێ چۆن لە یاری شەترەنجدا سەرکەوێ، چێژی زۆرتر دەبا لەو کەسەی تەنیا دەزانێ چۆن یاری بکا. هەروەها هەرچەندە زانراو هێژا بێ، زانیاریەکەش هێژایە و خۆشییەکەشی زۆرترە. هیچ بوونەوەرێک بەڕێزتر لەو کەسەی نییە، کە هۆی هەموو بوونەکانەو هیچ بوونەوەرێک هێژاتر لەو نەبووە و نابێ، چونکی هەر ئەوە کە خوونکاری هەردوو دونیایە و خێوی هەرچی چێ کراوی دونیایە. کەواتە هیچ ناسینێک لە ناسینی وی بەچێژتر نابێ‌و هیچ سەیرێک لە سەیری پەروەرێنەرت گیان‌گەشێنتر نییە و کاری دڵیش هەر ئەوەیە. چونکە چارەنووسی هەرشتەک، گەیشتن بە هۆی خولقانی ئەو شتەیە. ئەگەر دڵێک بۆ ئەو حەزە گوێ شل نەکا، هیچ سەیر نییە، زۆر لەشیش هەن بە هۆی نەخۆشیوە حەز لە خواردن ناکەن‌و تامی خۆڵیان لە تامی نان پێ خۆشترە. ئەگەر چاری نەخۆشییەکەی نەکرێ‌و شاوەت لە جێی خۆی دانەنرێ، خێوەکەی خۆی سیابەختو ژین بە خەسار، هەڵوەدا دەکا. ئەو کەسەش کە شاوەتی گەیشتن بە شتی بێجگە لە خوا لە دڵیدا بە هێزترە، نەخۆشە؛ ئەگەر دەرمان نەکرێ، چارەڕەشی ئەو دونیایە و بێجگە لە فەوتان چیتر نابینێ.

هەمووی ئەو شاوەتو خۆشیانە کە لە سۆنگەی پێنج هەستەوە هەست دەکرێن، لەشکری مەرگ هەڵیان دەپێچێ‌و دەفتەری ژینیان دەنێتەوە و هەرچی بۆیان هەوڵ دراوە، پووچەڵ دەکا. بەڵام چێژی ناسین، چونکە هی دڵە، پاش مردن زۆرتر دەبێ. چونکی دڵ بە مەرگ دەبووژێتەوە و پاش نەمانی ئەرکی شاوەتانی‌تر، چێژی دڵ زۆرترو زۆرتر دەبێ. ڕاڤەی ئەم باسە بە وردی لە باسی خۆشویستندا لە کۆتایی ئەم کتێبەدا دەبینیتەوە، ئەگەر خوا ئیزنی لە سەر بێ!

**بەشی هەشتەم: سەیرو سەمەرەکانی چێکردنی مرۆڤ**

لەمەڕ گەوهەری مرۆڤ زۆرتر لەمەی بێژرا، بۆ ئەم پەرتووکە زۆرە. بەڵام ئەگەر کەسێک لەمەی بێژرا زۆرتری ویست سەیری کتێبی «عجایب القلب» بکا بۆی چاترە. بەڵام هێشتا بەم دوو کتێبەش مرۆڤ بە وردی لە خۆی ناگات، چونکی ئەمە یەک ڕەهەندو ڕەهەندی‌تر دڵی مرۆڤە.

لە ئافراندنی دڵیشدا شتی سەیر زۆرەو لە هەر ئەندامیشدا چ لە ڕواڵەتو چ لە دڵەوە شتی سەیر زۆرن‌و لە هەر یەکەشدا حیکمەتی زۆر شراوەیە[1]. هەر ئەندامێکی مرۆڤ لە هەزاران دەمارو ئێسقان‌و ماسوولکە پێکهاتووە، هەریەکە بۆ ئەرکو کارێکو لە قەوارەیەکدان و تۆش لەمانە بێ ئاگای؛ تەنیا لەمە دەزانی دەست بۆ ڕاگرتنە و پێ بۆ ڕۆیشتن‌و زمان بۆ پەیڤین.

بەڵام هەر بەشێک چ لە ڕواڵەت یا خۆ باتین بۆ کارێک خولقاوەو بێ هەر یەکەیان، لەش تووشی کوسپ‌و چەڵەمە دێ. لەشی مرۆڤ -هەرچەند زۆر بچووکە- نموونەیەکە لە هەموو عالەم‌و ئەوەی تێیدایە. ئێسک وەکوو کێوە، ئارەق وەکوو ئاو، موو چەشنی دارو دەوەن، مێشک ئاسمانە و هەستەکان ئەستێرەن؛ ڕاڤەی ئەمە درێژەی هەیە. هەموو ئەو شتانەی لە عالەم دان، وێنەیان لە لەشدایە؛ وەکوو دێوو درنج‌و بەرازو سەگ‌و فریشتە، هەروەک پێشتر باسمان لێ کرد. لە هەر پیشەیەکیش وێنەیەکی لە لەشدایە؛ وەکوو ئەو هێزەی کە لە گەدە دایە، وەکوو چێشتلێنەرە، ئەوەش کە پاڵاوتەی خۆراک دەبا بۆ جەرگو تۆفالی بۆ ڕیخۆڵە، وەکوو شیرەگرە؛ ئەوەش کە پاڵاوتەی خۆراک لە جەرگدا دەکاتە خوێن، وەکوو ڕەنگرەزە و ئەوەش خوێنی سوور لە سنگدا دەکاتە شیری سپی‌و لە خایەدا دەیکاتە دڵۆپ، وەکوو گازرکەرە[2] و ئەوەش لە گورچێلەدا ئاو لە جگەر دەکێشێ تا بڕواتە نێو میزدان، چەشنی ئاوکێشە و ئەوەش تۆفاڵ دەهاوێژێتە دەرەوە، وەکوو کەنکەنەچییە[3] و ئەوەش زەرداو و سەفرا دەڕژێنێ تا لەش لە ناو با، وەکوو دڕدوکیخراپکارە و ئەوەی زەرداو و نەخۆشییەکانی‌تر پووچەڵ دەکاتەوە، وەکوو سەرۆکی دادگەرە؛ ئەم باسە درێژە و لێرەدا لەمە زۆرتر درێژە نادرێ.

مەبەست ئەوەیە بزانی کە لە ناخی تۆدا چەندەها شت خەریکی خزمەتی تۆن بە شەوو ڕۆژو تۆش لە گوێی گادا خەوتووی. ئەمانە لە خزمەتی تۆ ناحەسێنەوە و تۆش نە دەیانناسی‌و نە بەوەش دەزانی کە ئەمانەی بۆ پەرای تۆ بەڕێ کردووە. ئەگەر کەسێک خزمەتکاری خۆی بەر خزمەتت بنێرێ، شەو ڕۆژ سوپاسی دەکەی، کەچی ئەو کەسەی ئەم هەمووەی ناردۆتە خزمەتی تۆ و شەو ڕۆژ تا بژی، بۆ تۆ دەژین، نە پێی دەزانی‌و نە سوپاسی دەکەی.

زانینی بەشەکانی لەش، زانستی لێک‌کردنەوەی(تشریح) پێ دەڵێن. ئەمەش زانستێکی مەزنە و خەڵکی لێی بێ‌ئاگان‌و توخنی ناکەون. ئەوەش لەم بابەتە دەیخوێنن بۆ ئەوەیە تا لە پزیشکی شارەزا بن؛ پزیشکیش زانستێکی کەم بایەخە، هەرچەندە گەلێک پێویستە، بەڵام بە کاری ڕێی دین نایە.

---

١- شراوە: شاراوە.

٢- گازرکەر: ئەوەی چاو دەشوا و هەڵیدەکوتێ تا سپی بێتەوە.

٣- کەنکەنەچی: قومەشکەن.

بەڵام ئەوەی لەم زانستە وردبێتەوە تا جوانکارییەکانی پەروەردگار ببینێ، بێ‌گومـان شـارەزای سـێ دانستەی پەروەردگار دەبێ:

**یەکەم،** ئەوەی ئەم ئەندامەی خولقاندووە زانایەکی بەرزو بێ‌کەموکورتییـە و هـیچ کـزی لـە کاریـدا نییە. هیچ کردەوەیەک لە دونیا لەمە سەیرتر نییە کە لە دڵۆپێکە ئاوێـک، ئاوەهـا کەسـێک بخولقـێ. ئەوەش کە ئەم کارە دەکا، بە سانابیش دەتوانێ مردوو زیندوو کاتەوە.

**دووەم،** ئەویە کە زانایەکی زاڵە بە سەر هەموو زانستەکاندا. چونکە ئـەم هـەموو ئافرێنـدراوە سـەیرو سەمەرە ناخولقێ مەگین بە زانستقکی تەواو و بێ کەمو کووڕی.

**سێیەم،** ئەوەی کە ڕوحمو بەزەیی‌و دلۆڤانی ئافرێنەر بێ ڕادەیە و هـەرچی پێویـستی مـرۆڤ بـووە، دەستی لێ نەنووقاندووە و ئـەوەی زۆر پێویـستی بـووە وەکـوو دڵو جـەرگـو مێـشکـو هـۆی ژیـان، هەمووی پێداوەو ئەوانەش کە پێویستن-بەڵام نە بۆ ژیان- وەکوو دەستـو پـێو چـاو و زمـان، یـا خـۆ ئەوانەی پێویستی نەبووە و زیاد لە ڕادەیە و بۆ جوانییە وەکـوو ڕوومـەتی جـوانو پرچـی ڕەشو لێـوی ئاڵو باڵای عەرعەرو برۆی کەوانی‌و برژانگی درێژ، هەمووی لە سەر ڕوحـمو بـەزەییوە پـێ دراون. ئـەم بەزەییەی نەک بە تەنیا لە گەڵ مرۆڤ، بەڵـکوو لـە گـەڵ هـەموو ئافرێنـدراوەکانـدا، تەنانـەت مـێشو ژەنگەسوورەشدا کردووە و ئەوەی پێویستییان بووە و ئەوەش بـۆ جوانییـە، پێیـان دراوە. بـە هـەرچی ڕەنگـو ڕواڵەتی جوان بووە خەملێندراون.

کەواتە، مەبەست لە وردبوونەوە لـە خولقانـدنی لەشـی مـرۆڤ، ناسـینی پەسـنەکانی خودایـە. لـەم ڕەهەندەوە ئەم زانستە جێی ڕێزە، نە بەو هۆیەی کە پزیشکان لێی وردەوە دەبـن. هـەر بـەو جـۆرەی کە هەرچەند زۆرتر لە شیعرو گۆرانی‌و پیشە بگەی، زۆرتر لـە گـەورەیی شـاعیرو سـترانبێژو پیـشەزان دەگەی، ناسـینی کـارە مەزنـەکانی پـەروەردگار، کلیلـی ناسـینی گـەورەیی پـەروەردگارە. ئەمـەش درگایەکە بەرەو ناسینی خۆ، هەرچەند لە هەمبەر ناسـینی دڵ بچـووکـو کـەمبایەخـە. چونکـە ئەمـە زانستی لەشە و لەشـیش وەکـوو چارەوێیـە و دڵـیش سـوار. مەبەسـت لـە خولقانـدن، سـوارە نـەک چارەوێ، چونکە چارەوێ بۆ سوارە نەک سوار بۆ وی. مەبەست لەمەی بێژرا ئـەوە بـوو بزانـی ناسـینی خۆت بەم سانابیە نییە، ئەمە لە کاتێکدایە کە هیچ کەسو هیچ شتەک لە تـۆوە بـە تـۆ نزیکتـر نییـە. ئەوەی خۆی نەناسێ‌و بڵێ شتی‌تر دەناسم، وەکوو ئەوەیـە کەسـێک خـۆی برسـی بـێو بـڵێ هـەموو ڕووتـو برسییەکانی شار نان دەدەم؛ کە ئەمەش هەم ناحەزو دزێوە و هەمیش بۆی نالوێ.

## بەشی هەژدەهەم: ئەوپەڕی بێهێزی و نوقسانی مرۆڤ لە دونیادا

که گەورەیی‌و هێژایی گەوهەری دڵی مرۆڤت لە لا خویان[1] بوو، ئەمەش بزانە کە ئەم گەوهەرە هێژایانە پێت دراوەو پاشان لێتیان شاردۆتەوە: کە ئاگات لێ نەبێ‌و نەیپارێزی‌و بیخەیتە پشت گوێ، زیانێکی ئێجگار گەورەت تووش دەبێ. تێبکۆشە دڵی خۆت ببینیتەوە و لە نێو ئاپۆرەی دونیا دەری بێنی‌و دەربازی کەی‌و بیگەینی بە بەرزترین ئاستی خۆی؛ کە گەورەیی‌و سەرتری وی لەو دونیا خۆی دەنوێنێ. لەوێ بەبێ کەسەر شادی دەبینێ‌و هەتاهەتایە دەژی و دەسەڵاتی بێ کزییە و زانستی بێ لێلیە و بێ‌پەردەش سەیری سیمای خێوی خۆی دەکا.

بەلام لەم دونیایە گەورەیی وی لەوە دایە، کە ئەو هێزەی پێدراوە تا بە گەورەیی و هێژایی ڕاستەقینەی خۆی بگات؛ ئەگینا ئەمڕۆ لە دڵ نوقسانترو بێ‌دەرەتانتر کێیە؟ کە لە بەندی برسێتی، تینوێتی، گەرماو سەرماو ئێش‌و دەردو ئازارو تووڕەیی‌و چلێسییە و هەرچی هۆی ئاسوودەگی‌و چێژگرتنیە، دەبێتە هۆی خەسارو زیانی‌و هەرچی بە قازانجی بێ، لە گەڵ تاڵی‌و ئێشدا هاوڕێیە.

هێژابوون لە دونیا یا بە هۆی زانستەوەیە، یاخۆ هێزی شان‌و باهۆ[2]، یان دەس‌و دڵ فراوانی، یا بە هۆی جوانی‌و تەکووزییەوە.

کە سەیری زانستی مرۆڤ کەی، کێ لە ئەو نەزانترە؟ ئەگەر دەمارێک لە مێشکیدا دەربێنی، یان شێت دەبێ یا دەمرێ، ئەویش نازانێ چلۆن چاکەو دەبێ. بگرە دەرمانەکەشی هەر لە کن خۆی بێ‌و نەزانێ. ئەگەر لە هێزی شان‌و باهۆی بڕوانی، کێ لەو بێ‌هێزترە؟ مێشێک وەڕەسی دەکاو دووپشکێک دەیکوژێ. تەنانەت ئەگەر زەردەواڵەیەک پێوەی بدا، ژینی دەکاتە ژان‌و خەو و خوراکی لێ دەسێنێ.

ئەگەر لە ورەی بڕوانی، کە زیانێکی بچووکی کرد، تێکدەچێ، ئەگەر پاروویکی کەم بێتەوە لە ترسی برسانا دەتۆقێ. جا ڕژدتر لەمە کێیە؟

ئەگەر بۆ جوانیەکەی بڕوانی، پێستێکە بە سەر زبڵدانێکدا کێشراوە. ئەگەر دوو ڕۆژان خۆی نەشوا، خۆی لە بۆنی پیسی خۆی وەڕس دەبێ. جا پیستر لەوەی لە ناخیدایە و بە کوڵ دەیکێشێ‌و هەموو ڕۆژ چەندجار بە دەستی خۆی، خۆی دەشواو پیسی لە خۆی دەردکا، چییە؟

ڕۆژێک شێخ ئەبووسەعیدی ئەبولخەیر(ڕەحمەتی خوای لە سەر) لەگەڵ سۆفییەکانیدا بە ڕێگادا دەڕۆیشتن. لەو شوێنەدا تاقمێک خەریکی پاک کردنەوەی ئاودەستێک بوون، بۆیە پیسایی بە سەر ڕێگادا

---

[1]- خویان: خویا، ئاشکار.

[2]- شان و پیل.

دەڕۆیشت. سۆفییەکان هەریەکە و بەرەو لایەک هەڵاتن‌و دەستیان بە بینیانەوە گرت.شێخ راوەستا و گوتی: ئەی گەلۆ![1] دەزانن ئەم پیسایییە چیم پێ دەڵێ؟ دەڵێ: «من هەر ئەوەم دوێنێ لە بازاڕ بووم، خەڵکی بۆ کڕینم پارەکانی خۆیان دەدا؛ یەک شەو زۆرتر لەگەڵتان نەبووم، وام لێهات؛ جا ئێوە دەبێ لە من هەڵێن، یا من لە ئێوە؟»

لە ڕاستیشدا هەروایە و مرۆڤ لەم دونیایە لەوپەڕی نوقسانی‌و لاوازیدایە و ڕۆژی وی‌و سەردەمی وی سبەینێیە. ئەگەر کیمیای بەختەوەری بدا لە دڵ، لە ڕیزی درندان دەردێ‌و دەڕواتە ڕیزی فریشتەکان؛ کەچی ئەگەر بۆ دونیا پێکەنی‌و بوو بە یاری، سبەینێ سەگ‌و بەراز لەو سەرترن؛ چونکە ئەمانە هەموویان دەبنە خاک‌و لە ئازار دەرباز دەبن، کەچی ئەم تووشی ڕەنج‌و ئازار دەبێ. کەواتە کە ئاستی خۆی ناسی، دەبێ نوقسانی‌و بێ‌دەرەتانییەکەی خۆشی بناسێ، چونکە خۆناسین لەم بارەوە دەرگایەکە بەرەو ناسینی پەروەردگار.لەم پەرتووکەدا لە ڕاڤەی خۆناسیدا زۆرتر لەوەی بێژرا، نابێژرێ. خواتان لە گەڵ.

---

[1] - گەلۆ: خەڵکینە.

## سەردێڕی دووەم: لە ناسینی پەروەردگاردا

### بەشی یەکەم: خۆناسی، کلیلی خواناسی

لە کتێبی پێغەمبەرانی ڕابردوودا ئەم وتەیە بەناوبانگە کە پێیانی دەگوت: **اعـرِف نَفـسکَ تَعـرِف ربَّک**[1]. لە هەواڵەکانیشدا هاتووە کە **مَن عَرَفَ نَفسَهُ فَقَد عَرَفَ ربَّـهُ**[2]. ئەمـە بەڵـگەیە بـۆ ئـەوەی کـە نەفسی مرۆڤ وەکوو ئاوێنەیە کە هەرکە سەیری کا خۆی تێدا دەبینێ.

زۆرن ئەوانەی بە خۆدا دەچنەوە و خوداش ناناسن؛ کەواتە ناچارە لەناسینی نەفـسی خـۆی، چونکـە ئەوە ئاوێنەی ناسینە. ئەمەش دوو ڕەهەندی هەیە:

**یەکەمیان** ئەوەیە کە بەرپیوارترەو کـەمتر دەیناسـن‌و لـە گـەڵ هـەموو کەسـدا شرۆڤـەی نـاکرێ‌و نەگوتنیشی باشترە.

بەڵام ئـەو لایەنـەی کـە هـەموو کـەس لێـی دەگـا ئەوەیـە کـە: مـرۆڤ لـە نـاخی خۆیـدا بـوونی پەروەرێنەری خۆی هەست پێ دەکاو بە هۆی دانستەکانی خۆی، لە دانستەکانی خوا دەگاو لە شـارەزا بوون بە سەر وڵاتی لەشی خۆی، لە چۆنییەتی شارەزا بوونی خوا بە سەر دونیا دەگات.

ڕاڤەی ئەمەش ئەوەیە کە لە سەرەتاوە بوونی خۆی ناسی‌و زانی کە چەن ساڵێ لەمەو پێش نە ناوی بووە و نە کەس ناسیویە؛ هەروەک خودا دەفەرمێ: هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا [3]. ئەوەی مرۆڤ بەر لە بوونی خۆی دەیزانێ، هەر ئەوەیە کە پێشتر دڵۆپە ئاوێک بووە.

---

١ ـ خۆت بناسە تا خودای خۆت بناسی.

٢ـ ئەوی خۆی نەناسی، چلۆن پەروەردگاری دەناسی؟

٣ - قورئان ٧٦/١. بێ‌گومانە ماوەیەک لەم ڕۆژگارە بەسەر مرۆدا تێپەری و ئەو شتێ نەبۆ باس بکرێ. (هـ)

دڵۆپە ئاوێک بووە بەبێ‌دەستو پێو فامو ئاوەزو چاو و گوێو سەرو دەستو پێو زمان؛ بە تەنیا دڵۆپە ئاوێکی سپی. دەبینین ئەم هەمووە سەیرو سەمەرەی لێ بەدی هاتووە؛ جا یاخۆی بە دی هێناوە یان کەسی‌تر. ئێستا کە تەواو و ڕێکوپێکە، دەزانێ ناتوانێ تەنیا موویەکیش بخولقێنێ، چ بگا بەو دەمەی کە تەنیا دڵۆپە ئاوێکی بێ دەسەلاتو بێ‌ورە و نوقسان بووە. کەواتە ناچار، بوونی ئەو بەندیوارە بە بوونی پەروەردگارەوە.

کە لە جوانکارییەکانی لەشی خۆیدا ورد بووەوە-هەم لە ڕواڵەتو هەم لە دەروونیدا، هەروەک پێشتر هەندێکی ڕاڤە کرا- لە هێزی بەدیهێنەری خۆی دەگاو دەزانێ کە پەروەردگار، هێزێکی تەواوە و ئەوەی بیەوێ بە هەر جۆرێک پێی خۆش بێ، دەیخولقێنێ. هەر وەکوو چۆن لە دڵۆپە ئاوێکی سووکو بچووک، بوونەوەرێکی ڕێکوپێکو جوانی ئافراندووە.

کە لە ئەندامانی خۆیدا ورد بووەوە و تێگەیشت کە هەر یەک لە ئەندامانی دەرەوەی وەکوو دەستو پێو چاوو گوێو ئەندامانی ناوەوە وەکوو جەرگو دڵو ... چ ئەرکێکیان لە ئەستۆیە و بۆچ خولقاون، سەری لە هەمبەر گەورەیی‌و ژیری پەروەردگاری ڕادەمێنێو دەزانێ کە بە سەر هەموو شتێکدا زاڵە و لە هەموو شت شارەزایە و هیچ شت نییە لەو بەرپیوار بێ. ئەگەر هەموو زانایان کۆوە بنو تەمەنی درێژیان پێ بدرێو زانستی خۆیان کۆوەکەن بۆ ئەوەی ئەندامێک بەدەوتر لەوەی ئێستا هەیە چێ بکەن، قەد ناتوانن.

بەمەوە دیارە کە زانستی پەروەردگار بە سەر هەموو شتێکدا ڕاکێشراوە و بە هەموو شت شارەزایە. لە هەر بەشێک لە ئەندامانی مرۆڤدا بەردەبارییەک[1] هەیە. ئەوەی زۆرتر لەم بەردەبارییانە تێبگا، زۆرتر لە هەمبەر گەورەیی خوا ڕادەمێنێ.

کاتێک مرۆڤ لە ئەندامانی خۆیدا ورد دەبێتەوە کە نیازیان چییە، دەزانێ پێویستی بە خواردنو پۆشەنو خانووە؛ خواردنەکەشی پێویستی بە باو بارانو گەرماو سەرما و ئەو کارانەیە کە ئەمانە دێنێتە بەرهەم؛ هەروەها نیازی پیشەکان بە ئاسن، دارو بەردو مسو برێنجەیە؛ پێویستی ئەو ئامێرانە بە چێ کرانو داتاشرانو زانستی داتاشینیانە کە چۆن ساز دەکرێن؟ پاشان دەڕوانێتە ئەم هەمووە ئافرێندراوە کە چۆن بەم جوانییە خولقاونو لە هەر یەکە چەندان جۆری ئافراندووە؛ کە گەر نەیخولقاندایە قەد شتی وا بە بیری هیچ بیرمەندێکیشدا نەدەهات. دەبینێ هەموو شت بە هۆی بەزەیی خواوە ڕسکاوەو لەم سۆنگەوە دانستەیەکی‌تری پەروەردگاری لێ ڕوون دەبێتەوە، ئەوەش ڕوحمو بەزەیی‌و دلۆڤانی‌و

---

١ - بەردەباری- حیکمەت.

دەهەندەییە بۆ هەموو ئافرێنـدراوان. هـەروەک فـەرمووی: سَـبَقَت رحمَتـی غَـضَبی[1]. یـان پێغەمبـەر فەرمووی: بەزەیی پەروەردگار بۆ بەنـدەکانی خـۆی لـە بـەزەیی دایکێـک بـۆ کۆرپـەی بەرمـەمکانی زۆرترە.

کەواتـە، بـە ورد بوونـەوە لـە بـەدیهاتنی خـۆی، پـەروەردگاری دەبینـێو لـە سـەیرو سـەمەرە و حیکمەتەکانی دەورو پشتی خۆیدا تەواوتر بـوونی زانـستی خـوا دەبینـێو لـە کۆبوونـەوەی هـەمووی ئەمانە، لە دلۆڤانیو بەزەیی خوا دەگات.

بەم چەشنە خۆناسی دەبێتە ئاوێنەیەک بۆ خواناسی.

**بەشی دووەم: پاکی و بێخەوشی پەروەدگار**

ئەگەر مرۆڤ دانستەکانی خودا لە دانستەکانی خۆیەوە و زاتی ئەو لە زاتی خۆیەوە بناسـێ و پـاکی و بێخەوشی پەروەدرگاریش لە سۆنگەی پاکی و بێخەوشی خۆیـەوە دەناسـێ. مەبەسـت لـە پـاکی و بێخەوشی خودا ئەوەیە کە لە هەرچی لە خـەیاڵو بـیردا بگونجـێ پـاکو بەریـە و هەرچەنـد هـیچ شوێنێک نییە لەوێدا نەبێ؛ مرۆڤ وێنەی ئەمە لە خۆیدا دەبینێ کـە ڕاسـتەقینەی گیـانی -کـە ئێمـە پێی دەڵێین دڵ- بەرپیوارە و کەس نایبینێو لە بیرو خەیاڵیشدا ناگونجێ. هەروەک بێـژرا دڵ ڕادە و چەندییەتی نییە و دابەش ناکرێو چونکە ڕەنگو ڕادە و ڕوومـەتی نییـە، لـە خـەیاڵو داڵـغەدا نایـێ؛ چونکە چاو و خەیاڵ و بیر ئەوەی ڕەنگو ڕواڵەتو ڕادەی نەبێ نابینن. ئەوەی کـە دەڵـێی «شـتێک چۆنە؟» مەبەست ئەوەیە «بیچمی چۆنە؟» «بچووک یان گەورەیە؟» ئـەوەی ئـەم تایبـەتمـەندییانـەی نەبێ، باس لە چۆنییەتیکردنی بەتاڵە. ئەگەر بتهەوێ بزانی «چـۆن دەبـێ شـتێک بێـتو چۆنییـەتی نەبێ»بە خۆدا بچۆرەوە: ڕاستەقینەی تۆ -کە ناوەنـدی زانـستە- دابـەش نـاکرێو ڕادە و چۆنییـەتو چەندییەتی تێدا ناگونجێ. ئەگەر کەسێک پرسیاری کرد کە «رووح چ شتێکە؟» پەرسڤی ئەوەیـە کـە «چۆنییەتی بۆ رۆح نالوێ».

کە لەم دانستانەی خۆت گەیشتی، بزانە کە پەروەردگار لەم پاکو پاراوییەدا لە تۆ سـەرترە. خەڵـکی ڕادەمێنن لەوەی کە چۆن دەبێ کەسێک نە چەندی بێو نە چوون؛ کەچی خۆیـان هـەمان چەشـننو خۆشیان ناناسنو ئەگەر ئادەمیزاد لە بـوونی خۆیـدا ورد بێتـەوە، هـەزاران شـت دەبینێتـەوە کـە نـە چەندیەتییان هەیە و نە چۆنیەتی؛ وەکوو خۆشەویستیو توندو تووڕەییو چێژو ئێشو هـەزارانیتـر کـە نە چەندیەتییان دەبینێتەوە و نە چۆنیەتییان، چونکە ئەمانـە نـە ڕەنگیـان هەیـە و نـە ڕواڵـەت. هـەر وەکوو ئەگەر کەسێک بە تەما بێ ڕاستەقینەی گۆرانی یا بۆنو یان تام بناسێ، نسکو نائۆمێـد دەبـێ. هۆکەشی ئەوەیە کە چەندو چوونی داخوازی خەیاڵە کە لە هێزی بیناییوە سەرچاوە دەگرێ، بۆیـە لـە

---

[1] - حەدیس: رۆحمی من پێشتر لە تووڕەییمە.

هەر شتێکدا بۆ بەشی چاو دەگەڕێ. ئەوەش بەشی گوێیە-وەکوو گۆرانی- چاو لە دیتنی بێبەشە، ناتوانێ لە چەندو چوونی بگا و ببینێ؛ هەر وەکوو چۆن گوێ لە چێژی ڕەنگو ڕواڵەت بێبەشە. هەروەها ئەوەی بە دڵ هەستی پێ بکرێو بە ئاوەز بناسرێ، بەشی هیچ یەک لە پێنج هەستی تری پێوە نییە. ئەمەش لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەیەکە کە لە کتێبی مەعقوولاتدا ڕاڤە کراوە. مەبەست لەم پەیڤە ئەوەیە کە مرۆڤ لە بێ چەندوچوونی بوونی خۆیەوە لە بێچەندو چوونی خودا بگاتو بزانێ هەر وەکوو چۆن گیان هەیە و خونکاری لەشە و لە لەشدا هەرچی هەیە و چەندو چوونی هەیە، هەمووی هی وییە. هەروەها پادشای عالەم بێچەندو چوونە و هەموو چەندوچوونەکان لە ژێر سێبەری بەزەیی ئەودان.

چەشنێکی‌تر لە بێخەوشی[1] ئەوەیە کە لە هیچ شوێندا نییە. گیان لە هیچ بەشێکی ئەندامدا نییە، ناتوانین بڵێین لە دەستایە یان لە پێیە یا لە شوێنی‌تر؛ چونکە هەموو ئەندامەکانی‌تر دابەش(تجزیە) دەبنو ئەو نابێو کەی دابەشنەکراو لە دابەشکراودا جێگیر دەبێ؟ چونکە ئەودەم ئەویش دابەش دەبێ. هەرچەند لە هیچ ئەندامێکدا نییە، هیچ ئەندامێکیش لە دەسەڵاتی بەدەر نییە؛ هەموو لە ژێر ڕکێفی دانو ئەم پادشای لەشە؛ هەر وەکوو چۆن عالەم لە ژێر دەسەڵاتی خونکاری عالەمە و ئەویش بەری لەوەیە لە شوێنێکدا بێ. هەموو ئەم تەنزیهەیە بەوە ئاشکرا دەبێ کە بکرێ بە تەواوێ ڕاستەقینەی دڵ بڵێیت، بەڵام ئیزنی ئەو وتنە نییە. هەموو ئەمەی کە «انَّ اللّـهَ تَعالی خَلَقَ آدَمَ عَلَی صورَتِه» بەمە ئاشکرا دەبێ.

### بەشێ سێیەم: ناسینی پادشایی کردنی پەروەردگار

کە لە زاتی پەروەردگار گەیشتیو دانستەکانیو پاکیو پیرۆز بوونی لە چۆنییەتی لێت ڕوون بۆوە و جێگرنەبوونی لە شوێندا بۆت سەلمێندراو زانیت کە کلیلی ناسینی نەفسی، ناسینی پەروەردگارە، بەشێکی‌تر لە ناسینی ماوە، ئەویش ناسینی پادشایی کردنی پەروەردگارە لە جیهاندا کە چۆنە و بە چ شێوازە و ئەمر کردنی بە مەلائیکە و گوێڕایەڵ بوونی مەلائێکە لە هەمبەریو جێ بە جێ بوونی کارەکان بە مەلایەکەوە و ناردنی دەستوور لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەویو بزواندنی ئاسمانەکانو ئەستێرانو لە گرێدانی کارەکانی خەڵکی زەوی بە ئاسمانەکانەوە و لە ئەسپاردنی کلیلی ڕزقو ڕۆزی بە ئاسمان؛ جا ئەم هەمووە چۆن دەبێ؟

ئەمەش لایەنێکی مەزنە لە ناسینی پەروەردگار. ئەمە پێی دەڵێن ناسینی کردەوەکان (معرفت

---

[1]- بێخەوشی: تتریە.

افعال) هەر وەکوو ئەوانی پێشتر ناسینی زات (**معرفت ذات**)و ناسینی دانستەکان(**معرفت صفات**)ی پێ دەڵێن. کلیلی ئەمەش هەمیسان خۆناسییە. تۆ کە نەزانی خۆت لە خۆتدا چۆن پادشایی دەکەی، کوو لە پادشایی پەروەردگار لە جیهاندا دەگەی؟ ئەوەڵجار خۆت بناسە و لە کردەوەیەکی خۆت وەکوو نووسین ورد بەوە: بە تەمای بنووسی «**بسم‌الله**»، ئەوەڵ حەزێک لە ناختدا بە دی دێ، پاشان دڵت دەبزوێتەوە-نە ئەم دڵەی پڕ لە خوێنەی کە لە لای چەپی سنگتدایە-و شتێک نەرم لە دڵەوە دەڕواو دەگاتە مێشکت؛ ئەو شتە نەرمە زانایان پێی دەڵێن ڕۆح؛ نە ئەو ڕۆحەی ئێمە پێی دەڵێین دڵ، ئەم ڕۆحە ئاژەلانیش هەیانە و بە مردن دوایی دێت‌و کۆڵبەری هەستەکان‌و بزووتنەکانە. جا کە ئەم ڕۆحە گەیشتە سەرەتای مێشک و شێوازی «**بسم الله**»ی لە خەزانەی هەوەڵی مێشکدا -کە پێی دەڵێن خەیاڵ- بە دی هێنا، مێشک کاردەکاتە سەر دەمارەکان‌و دەمارەکانیش پەنجەکان دەبزوێنن‌و ڕواڵەتی «**بسم الله**» - کە لە خەیاڵدا بە دی هاتووە - بە بریکاری هەستەکان بە تایبەت چاو کە لە نووسیندا پێی نیاز هەیە، لە سەر لاپەڕەی کاغەزدا دەنووسرێ.

کەواتە هەر وەکوو چۆن جێ بە جێ کردنی ئەو کارە لە سەرەتاوە حەزێک بوو کە لە تۆدا هاتبووە دی، سەرەتای هەموو کردەوەیەک دانستەیەکە لە دانستەکانی خوداو پێی دەڵێن ئیرادە.

هەروەها چۆن سەرەتا کاریگەری ئەم ئیرادەیە بە سەر دڵەوەیە و پاشان بە هۆی دڵەوە دەگاتە بەشەکانی‌تر، هەوەڵ ئیرادەی خودا بە سەر عەرشایە و پاشان دەگاتە شوێنانی‌تر. چۆن لە لەشدا شتێکی نەرم وەکوو هەڵم -کە ڕۆحی پێ دەڵێن- ئەم ئیرادە دەگوازێتەوە بۆ مێشک، پەروەردگاریش گەوهەرێکی نەرمی هەیە کە ئەم ئیرادەیە دەگەیێنێتە زەوی‌و پێی دەڵێن فریشتە و ڕۆح‌و ڕۆحی پیرۆز(روح‌القدس). هەروەها چۆن ویست لە دڵەوە دەگاتە مێشک‌و دڵ لە سەرووی مێشک دایە، ویستی خواش لە عەرشەوە دەگاتە زەوی‌و عەرش لە لای سەرووی زەوی دایە.

هەر وەکوو چۆن نووسینی «**بسم الله**» ئیرادەی تۆ بوو و لە خەزانەی ئەوەڵی مێشکدا بە دی هات‌و کاری نووسینی «**بسم الله**» بە هۆی ئەو ویستەوە هاتە دی، هەرچی لە جیهاندا دێتە دی لە سەرەتاوە شێوەی لە لەوحی پارێزراودا (لوح محفوظ) دێتە دی.

هەر وەکوو چۆن ئەو ورەی کە لە مێشک دایە، دەمارەکان دەبزوێنێ‌و دەمارەکانیش دەست‌و پەنجەکان دێننە جووڵە تا ئەنگوستەکان قەڵەم ببزوێنن، هەروایە ئەو گەوهەرە ناسکانەی کە بەسەر ئاسمان‌و زەویدا بریکارن، ئاسمان‌و ئەستێرەکان دەجووڵێنن.

هەروەها چۆن ورەی مێشک بە هۆی دەست‌و پێوەندەکانیەوە، ڕەگ‌و دەمارەکان دەبزوێنێ، ئەو گەوهەرە ناسکانەش -کە مەلائیکیان پێ دەبێژن- بە هۆی ئەستێرەکان‌و پێوەندی نێوانیان تیشک بارینیان بۆ سەر جیهانی خواروو، سروشتی چاوکەکانی عالەم دەبزوێنن؛ کە ئەوەش چوار دانستەیە:

گەرمی، ساردی، تەڕیو وشکی.

هەروەها چۆن قەڵەم مەرەکەب بڵاو دەکاتەوە و کۆی دەکاتەوە تا بنووسێ «**بسم الله**»، ئەم گەرمیو ساردییە، ئاو و خاک دەبزوێنن.

هەروەها چۆن کاغەز ئەو مەرەکەبە دەگرێتە خۆ، تەڕی قەوارەی ئەم مەبەستانە پێک دێنێو وشکی قەوارەکە دەپارێزێ؛ ئاشکرایە بەبێ وشکی هیچ بیچمێک خۆی ڕاناگرێ.

هەروەها چۆن قەڵەم بە ئاریکاری هەستی بینایی، وێنەی خەیاڵی لە سەر دڵی کاغەز هێنایە دیو نووسی «**بسم الله**»، تەڕیو وشکیش بە هاریکاری مەلائیکە، دانستەکانیتر دەبزوێننو وێنەی ڕوەکو خزۆکو ئاژەڵانیتر لەم عالەمەدا بە پێی ئەو وێنەیە کە لە لەوحی مەحفووزدایە دێننە دی.

هەروەها چۆن لە لەشدا ئاخێزگەی هەر کارێک، دڵە و پاشان ئەندامانیتر دەگرێتەوە، ئاخێزگەی هەر کارێکی عالەمیش عەرشە.

هەروەک چۆن هەوەڵجار دڵە کە ئەو تایبەتمەندییە وەردەگرێو پاشان ئەندامانیتر دەکەونە دووی، خەڵک لایان وایە کە مرۆڤ هەمان دڵی خۆیە، پەروەردگاریش بە هۆی عەرشەوە کار و باری دونیا پێک دێنێ، بۆیە زۆربەی خەڵکی پێیان وایە کەماڵی خوا لە ئاسماندایە.

بەو جۆرەی کە ئەگەر تۆ بە سەر دڵدا زاڵ بیو کاری دڵ بە ویستی تۆ جێ بە جێ بێ، دەتوانی بە سەر وڵاتی لەشی خۆشتدا زاڵ بێ، خودای مەزنیش بە ئافراندنی عەرش، بە سەریدا زاڵ بوو و عەرشی ڕاگرتو بە سەر عالەمدا دەسەڵاتی بوو؛ هەروەک دەفەرمێ: ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ[1].

باش بزانە ئەمەی بێژرا ڕاستە و ئەوانەی لە ڕاستی گەیشتوونو زانان، بە چاوی دڵ سەیری دەکەنو ئەم واتایانە بە دڵ سەلماندووە کە اِنَّ اللّهَ -عَزَّوَجَل- خَلَقَ آدَمَ عَلَى صورَتِه.

بە ڕاستیش بزانە کە تەنیا پادشایان، پادشایەتی دەزانن. بۆیە تۆزکاڵێک پادشایەتیت پێ دراوە تا بە سەر وڵاتی لەشی خۆتدا زاڵ بیو بەڕێوەی ببەی، تا لە پادشایەتی بگەیو بەم چەشنە پادشای عالەمیش بناسی. کەواتە کڕنۆش بەرە لە بەر ئەو خودانەی تۆی خولقاندو وڵاتێکی پێت داو پادشایەتییەک لە چەشنی پادشایەتی خۆی. دڵێکی پێ دای لە چەشنی عەرشی خۆی، ڕۆحی تۆی -کە سەرچاوەکەی دڵە- کردە ئیسرافیلی تۆو، مێشکتی کردە کورسیو لە خەزانەی داڵغەکانت لەوحی پارێزراوی (محفوظ) چێ کرد. چاو و گوێو هەستەکانتی وەکوو فریشتەکان داناو خرۆکەی مێشکت - کە کانی دەمارەکانی دڵە - کردە ئاسمان و ئەستێرەکانی تۆو، ئەنگوستو قەڵەمو

---

١ - (قورئان، ١٠/٣) ئەوسا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی خۆی دامەزراوە و بەکاروباری رادەگا (هـ)

مەرەکەبی کردە دانستەکانی ژێر ڕکێفتو تۆی لەم عالەمەی خۆتدا تاقانە و بێوێنە و بێچەندو چوون دانا. پاشان گوتی: ئاگادار بە لە خۆتو خونکاریت[1]، بێئاگا نەبیو کە ئەو دەم لە خودانی خۆشت بێ-ئاگا دەبی؛ فَاِنَّ اللّهَ خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ. فَاعرِف ذالِکَ واعرِف نَفسَکَ یا انسانُ تَعرِف رَبَّکَ[2].

## بەشی چوارەم: مەبەست لە ڕاڤەی بەراوردی نێوان پادشایەتی مرۆڤ و پادشایەتی پەروەردگار

کەواتە لەم پەیڤەدا کە پادشایەتی مرۆڤو پاشایەتی خودا بەراورد کرا، بە دوو زانیاری گرینگ ئاماژە کرا:

یەکەم، زانیاری نەفسی مرۆڤ و چۆنیەتی بەندیواری ئەندامانی مرۆڤ بە ورە و دانستەکانی ویو چۆنییەتی بەندیوار بوونی دانستە و ورەکان، بە دڵەوە. ئەمەش زانستێکی بەرفراوانە کە دەبێ بۆ خۆی لە چەن کتێبدا لێک بدرێتەوە.

ئەویتر وەردانەوەی پێوەندی وڵاتی پادشای عالەمە و فریشتەکانیو پێوەندی فریشتەکان پێکەوە و پێوەندی ئاسمانو زەوی دەگەڵ ئەوان؛ ئەمەش زانستێکی بەرفراوانترە.

مەبەست لەم ئاماژانە ئەوەیە تا ئەوەی کە ژیرو وشیارە، بەمانەی بێژران بروای ببێو گەورەیی خودا بەم پەیڤە بناسێو ئەوەش کە ئەمانە دەزانێ، بە ئاگا بێ کە چەن بێئاگایە و چەن لە گوێی گادا نووستووە و لە ناسینی پەروەرێنەری بێبەش بووە. خەڵکی لە سەیری پەروەردگاریان چەن بێئاگان، ئەمەش کە بێژرا بۆ ئەوەی خەڵکی تێبگەن دیسان زۆر کەمە.

## بەشی پێنجەم: چواندنی سروشتی[3] و ئەستێرەناس بە مێرووڵە

سروشتیی داماو و، ئەستێرەناسی ڕاماو، کارەکان دەخەنە ئەستۆی هەست یان ئەستێران.

چیرۆکی ئەمانە وەکوو ئەو مێرووڵەیە کە بە سەر لاپەڕەیەکی سپیدا پیاسە دەکاو لە پڕ دەبینێ بە سەر لاپەڕەکەدا وێنەیەک دەکێشرێ. نەختێ سەر هەڵدەبڕێو لە پێش کەپۆیدا نووکی قەڵەمێک دەبینێ. شاگەشکە دەبێو دەڵێ: «لە ڕاستەقینە گەیشتم، ئەم وێنەکێشانە کاری قەڵەمە». ئەمە چیرۆکی سروشتییە کە بێجگە لە دوایین هۆی ئەم کارە هیچیتر نابینێ.

---

١ - خونکار= پادشا.

٢ - خودا مرۆڤی لە چەشنی خۆی ئافراند. ئەمە بزانە و خۆت بناسە ئەی مرۆڤ! تا پەروەرێنەری خۆت بناسی.

٣- سروشتی: لە زمانی کەلامی کۆندا «طبیعی» بە کەسێک بێژراوە کە قائیل بە بوونی خودا و جیهانی پاش مەرگ نەبووە و هەر ئەوەی لە لا ڕاست بووە کە بە هۆی یەکێک لە هەستەکانیەوە ناسیویە؛ ئەوەی ئەمرۆ پێی دەڵێن ماتریالیست. جا بۆیە «طبیعی»م نەکردووە بە مادەخواز یان ماتریالیست چونکە زمانی وەرگێڕانەکەی تێکدەدا، بۆیە منیش نووسیومە «سروشتی»؛ واتە ئەوەی تەنیا قایل بە سروشت و ئەوەی دەبینرێت بێت.

مێرووله‌یه‌کی‌تر هات؛ نەختێ سەرتر ڕوانی‌و ئاسۆیەکی زۆرتری دی‌و وتی: «بە هەڵـەدا چـووی؛ مـن ئەم قەڵەمە بە تەنیا هۆیەک(علت) دەزانم، لە سەرووی ئەمـەوە شـتێکی‌تـر بـە دی دەکـەم کـە ئـەم وێنەیە دەکێشێ». شادوشوکور بوو و گوتی: «ڕاستی ئەوەیە من دەیـزانم؛ وێنـەکێش پەنجـەکانن نـە قەڵەم. قەڵەم فرمانبەری پەنجەیە». ئەمەش چیرۆکی ئەستێرەناس بوو کە تێگەیشت هەسـتەکان لـە ژێر ڕکێفی ئەستێرانن، بەڵام نەیزانی کە ئەستێرەکانیش بۆ خۆیان دەسەمۆی فریشتەکانن‌و هەروا پلـە بە پلە تا دەگاتە پەروەردگار.

هەر وەکوو چۆن ئەم جیاوازییە لە نێوان ئەستێرەناس‌و سروشتیدا لەم عالەمەدا هەیە، لـە نێـوان ئـەو کەسانەش کە ڕێ دەبەنە عالەمی ئەرواح، جیاوازی هەیـە. چونکـە زۆربـەی ئـەو کـەسـانەی کـە لـەم دونیایە تێپەڕاون و شتێکیان بێجگە لەم دونیایە بینیوە، هەر لە سەرەتای ڕێـدا گرسـاونەتـەوەو ڕێگـای هەورازیان نەبڕیوەو لە نشیودا ماونەتەوە. لە عالەمی ئەرواحدا –کە لە جیهانی ڕووناکییەکانـە– لـە هـەر قۆناغێکدا کۆسپ‌و پەردەی جۆراوجۆر هەیە: ئاستی هەندێ وەکوو ئەستێرەیە و هـی بـرێکیش وەکـوو هەیڤە[1] و هی تاقمێکیش وەکوو ڕۆژە. ئەمەش پەیژەی هەڵزنانی[2] ئەو کەسانەیە کە دەرگـای جیهـانی فریشتەکانیان بۆ دەکەنەوە؛ هەر وەکوو خودا بە حەزرەتی ئیبراهیمی نواندو فـەرمووی:وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ[3]. تـا ئێـرە کـە کـوتی: إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ[4]. هەر لەم سۆنگەوە بوو پێغەمبەری خوداش فەرمووی: انَّ اللّـهَ سَبعَينَ حجاباً مـن نـوُر لَـو كَشفَهَا لاَحرقَت سُبُحاتُ وَجهه كُلَّ مَن اَدركَ بَصَرُهُ[5]. ئەم چەمکـە لـە کتێبـی «مـشکوة الانـوار»و «مـصفاة الاسرار»دا بە وردی ڕاڤە کراوە.

مەبەست ئەمەیە کە بزانی، سروشتی داماو، ئەگەر هۆی کارێکی بە گـەرمی و سـاردی زانـی، ڕاسـت دەڵێ، چونکە ئەگەر ئەم هۆوانە نەبوایەنە ئـامرازی دەسـتی پـەروەردگار، هـیچ زانـستێکمان نـەدەبوو؛ بەڵام هۆی بە هەڵە چوونەکەی ئەوەیە کە ڕوانگەی تەسکە و چاوی سەرتر نابینێ‌و لە ڕێگـا ناپەڕێتـەوە و بۆ سەرەتای ڕێگا گلێر دەبێتەوە. هۆکانی بە فرماندەر زانی نەک فرمانبەر؛ بە خودانی زانین نەک بـە بەنی؛ ئەم هۆوانە خۆیان لە خوارترین خزمەتکارانن.

---

١- هەیڤ: مانگ.

٢- هەڵزنان: بەرەو سەرچوون.

٣ - (قورئان، ٦/٧٥) [هەر ئەو دەمەش بوو کە] ئێمە نیشانی ئیبراهیممان دا دام و دەزگای عاسمانان و زەمینە سەربەکییە. (هـ)

٤ - (قورئان، ٦/٧٩) وامن – بە دڵپاکی – رووم کردە ئەو کەسە کە ئاسمانان و زەمینی داهێناوە. (هـ)

٥ - پەروەردگار حەفتا پەردەی هەیە، گەر ئەو پەردانە لابدا، تیریژەکانی، هەر بینەرێک دەسووتێنن.

ئەستێرەناس کە ئەستێرەی بە هۆکار زانی، ڕاست دەکا؛ کە گەر وا نەبوایە شەو و ڕۆژ هاوشان دەبوون-کە هەتاو ئەستێرەیێکە و هۆی ڕووناکیو گەرمی جیهانە- و زستانو تاوسان لێک جیا نەدەبوون. ئەو خودایەی کە هەتاوی گەرمی خولقاند، چ جێی دامانە کە زوحەلی، سارد و وشک خولقاندو ناهیدی گەرمو بە تین. ئەمە هۆی شوبهەیە لە موسولمانیدا. بەلام هۆی بە هەلەچوونی ئەستێرەناس ئەوەیە کە ئەستێرەی بە بنەما داناو بەندەیی ئەوانی نەدیو نەیزانی کە وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓ[1]. «مُسَخَّره» ئەوەیە کە بخرێتە بەر کار. کەواتە ئەمانە کرێکارن نەک بۆ خۆیانو بە ئیزنی خۆیان، بەلکوو بە هۆی فریشتەکانەوە خراونەتە بەر کار؛ هەر وەکوو دمارەکان کە لە سۆنەگەی ورەی مێشکەوە بەشەکانیتر دەگرنە بەرکار. ئەستێرانیش لە ریزی فەرمانبەرانن، هەرچەند نەختێ ئاستیان سەرترە، بەلام نین لە ڕیزی نزیکانی بارەگای پەروەردگاردا.

## بەشی شەشەم: هۆی دژایەتی لە نێوان خەلکدا

هۆی زۆربەی دژایەتیگەلی نێوان خەلکی، ئەوەیە کە هەریەکە و تا ئاستێکیان دیوە و پێیان وایە هەمووی هەر ئەوەیە. چیرۆکی ئەمانە وەکوو ئەوەیە کە لە بازاڕێکدا فیلێکیان هێنابێ. خەلکی ئاپۆرەیان داوە بۆ دیتنی. تاقمێک کوێریش دێن بۆ سەیری. دیارە ئەم کوێرانە بۆ سەیرکردنی دەبێ دەستی پێدا بسوون. جا یەکیان دەست دەدا لە گوێی، یەک لە پێی، یەکیش لە ددانی. کە کوێرەکان کۆوە دەبنو باسی فیلەکە دەکەن، یەکیان کە دەستی لە پێی داوە دەلێ: فیل هەر وەکوو ئەستوونە. ئەویتریان کە دەستی لە گوێی داوە دەلێ هەر وەکی پەلاسە؛ ئەوەشیان کە دەستی لە دانی داوە دەلێ هەر وەکوو بەردە. ئەمانە سەرجەم ڕاست دەلێنو بەهەلەشدا چوون؛ چونکە پێیان وایە فیلیان بە تەواوی ناسیوە و کەچی واش نییە.

هەروایە ئەستێرەناسو پزیشک هەریەکە و یەکێک لە نۆکەرانی پەروەردگاریان دیوە و لە دەسەلاتی دۆش داماونو دەلێن: «خوونکار هەر ئەمەیە؛ «هَٰذَا رَبِّي». تا ئەو کاتەی کەسێکیتر لەوە سەرتر دەبینێو لە کەموکورتی ئەوە تێدەگاو دەلێ: «ئەم لە خوار ئەویترە و ئەوەش کە نزمتر بێ بۆی نالوێ پەروەردگار بێ: قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ[2]».

---

١ - (قورئان، ٥٤/٧) خۆر و مانگ و ئەستێرانی بەدیهێنا و هەر دەژێر فەرمانی ئەودان. (هـ)

٢ - (قورئان، ٧٦/٦) گوتی: هەرچی ئاوا ببێ خۆشم ناوێ. (هـ)

## بەشی حەوتەم: ناسینی زیکرە چوارینەکان

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لە واتای زیکری: «**سبحان الله**»، «**الحمدلله**»، «**لااله الا الله**»و «**الله اکبر**» بگەی، کە ئەم چوار وشەیە هەرچەند کورتن، هەموو ناسینی خودای تێدا کۆوە کراوە.

کە بە هۆی پیرۆزی خۆتەوە لە پیرۆزی وی گەیشتی، «**سبحان الله**»ت زانیوە.

کە لە پادشایی خۆت بە وردی لە پادشایی ئەو گەیشتی-کە هەموو هۆیەک لە دەستی ویدا دەسەمۆیە وەکوو قەڵەم لە دەستی نووسەردا- لە واتای «**الحمد لله**» گەیشتووی، کە بێجگە خوا ناندەرێک نییە، سوپاسیش هەر بۆ ئەو دەبێ.

کە لەمەش گەیشتی بێجگە لە خوا کەس لە خۆڕاو بێ ئیزنی ئەو هیچ ناکاو نابزوێ، «**لا الە الا الله**»ت ناسیوە.

ئێستا دەبێ «**الله اکبر**» بناسیو بزانی بەم هەمووەش کە لە پەروەدگارت بیستووە، هیشتا هەر هیچ نازانی. کە واتای «**الله اکبر**» ئەوەیە:خودا گەورەترەو ڕاستیش ئەمەیە کە گەورەتر لە هەر شتێکە کە بکرێ دەگەڵی بەراورد بکرێ. واتای ئەمە نییە کە لە شتەکانیتر گەورەترە؛ چونکە دەگەڵی هیچ شتیتر نییە تا لەو گەورەتر بێ؛ هەموو بوونەوەران لە نووری وینو ڕووناکی هەتاویش شتێک بێجگە لە هەتاو نییە تا بتوانین بڵێین هەتاو لە ڕووناکی خۆی گەورەترە. واتای «**الله اکبر**» ئەوەیە کە خودا گەورەتر لەوەیە کە بە پێوەری ئاوەزی مرۆڤ بناسرێ.

پەنا بە خوا لەوەی کە بڵێین پاکیو پیرۆزی وی وەکی مرۆڤ بێ، کە ئەو پاکە لە هەرچی وێکچوونە دەگەڵ دەسکردەکانی خۆی، چ بگا بە مرۆڤ. پەنا بە خوا کە گەر بڵێین پادشایی وی وەکوو پادشایی مرۆڤە بەسەر لەشی خۆیدا؛ یاخۆ دانستەکانی -وەکوو زانستو دەسەڵات- وەکوو دانستەکانی مرۆڤن؛ بەڵکوو هەموو ئەمانە بۆ ئەوەن تا بەڵکوو نەختێ بە قەدەر زانستی مرۆڤی بێ-توانو بێپەنا لە گەورەیی پەروەردگار بۆی خویان بێ.

ئەمە وەکوو ئەوەیە منداڵێک لێمان بپرسێ چێژی دەسەڵاتداریو حکوومەت کردن چۆنە؟ ئێمەش بڵێین وەکوو خۆشی چەوگان لێدانو گۆ فڕێدانە؛ چونکە بێجگە لەم خۆشیە لە خۆشیتر ناگا. دیارە خۆشی دەسەڵاتداریو چەوگان لێدان هیچ وەک یەک نین، بەڵام بە گشتی هەردووکیان خۆشینو ناوی چێژیان لە سەرە؛ کەواتە لە ناودا وەکی یەکن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا لێک جیاوازن. بەم جۆرە بۆ تێگەیاندنی منداڵ دەبێ هەروا بڵێی. دیارە ئەم وێنانەی کە هێنامانەوە هەر بەم چەشنەن.

کەواتە بێجگە لە پەروەردگار خۆی، کەس بە ڕاستی پەروەردگار ناناسێ.

## بەشی هەشتەم: ڕێگای شەریعەت ڕێی بەختەوەرییە

ڕاڤەی ناسینی پەروەردگار درێژە و لەم کتێبەدا ناگونجێ. هەر ئەمەی بێژرا بەستە بۆ ئاگادار کردنو دنەدان بۆ گەیشتن بەم ناسینە، تا ئەو جێگای کە بۆ مرۆڤ بلوێ، بەختەوەری مرۆڤ لە ناسینی خاکەساری خودانی دایە.

هۆی ئەمەی کە چۆن بەختەوەری لە ناسینەوەیە، پێشتر بێژرا. بەلام هۆی ئەمەی کە بەندەگیو پەرستن دەگاتە بەختەوەری، ئەمەیە کە مرۆڤ پاش مردن، دەڕواتە بەر بارەگای پەروەدگاری؛ وَ الیهِ المَرجعُ والمَصیرُ[1]. هەرکەس بڕیار بێ لەگەڵ خۆشەویستێکیدا پێکبگەن، بەو پێکگەیشتنە هەست بە بەختەوەری دەکا. جا هەرچەند ئەو کەسەی خۆشتر بوێ، پتر هەست بە بەختەوەرتری دەکا؛ چونکە خۆشیو شادوشوکور بوون بە دیداری خۆشەویست لە وتن نایە. خۆشەویستی خوداش بە دەست نایە مەگین بە ناسینو زۆر یاد کردنەوەی؛ چونکە هەر کەس گراوی کەسیتر بێ، زۆری یاد دەکا. ئەگەر زۆرتری یاد کا، زۆرتر گراوی دەبێ. بەم بۆنە بوو کە وەحی هاتە سەر داوود–دروودی خوای لەسەر– کە: «اَنَا بُدکَ للازمٌ فَالزَم بُدکَ»؛ واتە چارەی تۆ منمو سەروکاری تۆ لە گەڵ منە؛ کەواتە یەک سات لە یادی من ڕامەمێنە.

بە چاوەدێری بە سەر عیباداتەوە یادی خودا لە دلدا سەقامگیر دەبێو ئاسوودەگی لە عیبادەت ئەو دەمەیە کە دڵ لە گیرودەیی شاوەتەکان دەرباز بێو دڵ لە شاوەت دەرباز نابێ مەگین ئەو دەمەی دەست لە سووچو تاوان بشوات. کەواتە، دەرباز بوون لە تاوانو سووچ، هۆی ڕزگاری دڵە و بەجێ هێنانی بەندەگی، هۆی جێگیر بوونی زیکرە و ئەم دوانەش، هۆی هاتنە دی خۆشەویستییە کە وەکوو تووی بەختەوەرییە و بەختەوەریش ڕزگاری پێ دەڵێن. هەروەک خودا فەرمووی: قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ[2].

بەلام چونکە هەموو کردەوەیەک ناکرێ پەرستن بێو هەندێکی دەکرێ عیبادەت بێ و هەندێکی نا؛ هەروەها واز هێنان لە هەموو شاوەتێکیش ناکرێو لە ڕاستیشدا شیاو نییە؛ چونکە ئەگەر خۆراک نەخۆین، دەمرینو ئەگەر ژن نەهێنین، بەرەی مرۆڤ دوایی دێ. کەواتە هەندێ لە شاوەتەکان بۆ وەلانان دەشێنو هەندێک دەبێ بمێنن؛ بەلام دەبێ لە نێواندا ڕادە ڕاگیرێ.

ئەم ڕادەیە لەم دوو خاڵە بەدەر نییە: مرۆڤ یا ئاوەزی خۆی دەکاتە پێوەرو پێوانە، یا هی کەسیتر.

---

١- گەڕانەوە بۆ لای ئەوە.

٢ – (قورئان، ١٤/٨٧-١٥) دیاریش هەرکێ پاک ژیا، ڕزگار بووە. یادی نێوی پەروەرندەی کرد و نوێژی بەجێهێنا. (هـ)

بەلام بۆی نالویٚ کە تەنیا پاڵ بە ئاوەزی خۆیەوە بدات؛ چونکە کاتیٚ شاوەت زۆری بۆ هێنا، ڕێگەی خوای لیٚ دادەگریٚو چاکە و خراپەی لیٚ تێک دەدا. کەواتە دەبیٚ جڵەوی هەوەسی بسپێرێتە کەسیتر. هەرکەس بۆی نییە بە ئاوەزی خۆی ببزویٚ، مەگین بیناترینی خەڵکی، واتە پێغەمبەرانی خودا، سەلامو سەڵواتی خودایان لیٚ بیٚ.

کەوتنە دووی شەریعەتو ڕاگرتنی ڕادەی فەرمانەکان، پێویستە بۆ ڕێگای بەختەوەری و واتای بەندەگیش هەر ئەمەیە. هەر کەسەش لە تخووبی[1] شەرع خۆی ببوێریٚ، بە دەستی خۆی، خۆی تەفرو توونا دەکا. بۆیە خودای مەزن فەرمووی: وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥ[2].

## بەشی نۆهەم: گومڕاییو نەزانی ئەهلی ئەباحەت[3]

کەسانێک کە ئەهلی ئەباحەت بوون، بە هەڵەدا چوونو ڕادەی خوایان ڕانەگرت. نەزانییان لە حەوت ڕەهەندەوەیە:

یەکەم: نەزانی تاقمێکە کە بە خودای مەزن بڕوایان نییە. چونکە لە نێو هەمانەی خەیاڵو دالغەیاندا بۆی گەڕانو چەندو چوونی ویان دۆزی؛ کە نەیاندیەوە، وتیان خودا نییە و هۆی هەموو بوونێکیان لە نێو سروشت و ئەستێراندا زانیو پێیان وابوو کە مرۆڤو هەموو گیاندارانو ئەم جیهانە بەم هەمووە ڕێکوپێکیو تەکووزییەوە لە خۆوە ڕسکاوە، یاخود لە سەرەتاوە بووە و بە هۆی سروشتەوە خولقاوە. وێنەی ئەمانە وەکوو ئەو کەسەیە نووسراوێکی لە غایەت بەدەر جوانو بەدەو ببینیٚو پێی وابیٚ لە خۆوە نووسراوە، یا خۆ هەر لە سەرەتاوە بووە و نووسراوە. جا کەسێک کە ئەوەندە کوێرو نابینا بیٚ، کوو ڕێگای بەختەوەری دەبینێتەوە؟ هۆی هەڵەی سروشتی[4] و ئەستێرەناس پێشتر بێژرا.

**ڕەهەندی دووهەم**: نەزانینی تاقمێک لە مەڕ دوارۆژ؛ پێیان وایە مرۆڤ وەکوو ڕوەک یان گیانداری-ترە، کە مرد، ژینی دەپێچرێتەوە و دوایی دیٚو لە شوێنیتردا ناژیتەوە. هۆی ئەمەش خۆ نەناسینە؛ چونکە هەر ئەوەندە خۆی دەناسیٚ کە کەر و گاو دارو بەرد دەناسیٚ. ئەو گیانەی کە ڕاستەقینەی مرۆڤە ناناسیٚ؛ کە ئەوە هەتاهەتاییە و قەد نامریٚ، بەلام جەستەی لیٚ دەستێننەوە و بەوە دەڵێن مردن. ڕاستەقینەی ئەم بابەتەش لە سەردێری چوارەمدا لێکدەدرێتەوە، ئەگەر خوا ئیزنی لە سەر بیٚ.

---

١- تخووب: سنوور، سەرحەد.

٢ - (قورئان، ١/٦٥) ئەمە کەوشەنی خودایە و هەر کیٚ لە کەوشەنی خودا بەولاتر چیٚ، ناحەقی لەخۆی کردووە. (هـ)

٣- نەباحەت: کاری حەرام لە شەرعدا.

٤- طبيعيون.

**ڕەهەندی سێهەم**: نەزانی ئەو کەسانەیە کە بڕوایان بە خوداو ڕۆژی پەسلان هەیە-بڕوایەکی لاواز- بەلام دەڵێن خوا چ پێویستێکی بە پەرستنی ئێمەیە و لە نەپەرستنی ئێمەش چ زیانێکی تووش دەبێ؟ کە ئەو پادشایە و بێنیازە لە پەرستنی ئێمەو پەرستن‌و نەپەرستن، لە لای وی وەکوو یەکە. ئەم نەزانانە هەردەم لە قورئانیشدا دەبینن کە دەفەرمێ: وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِ[1] یا وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِ[2] یا مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِ[3]. ئەم کەسە لە شەریعەت نەگەیشتووە کە پێی وایە دەبێ قازانجی پەرستنمان بۆ خودا بێ، نەک خۆمان. ئەمە وەکوو ئەوەیە نەخۆشێک بڵێ چ قازانجێ دەگاتە پزیشکم ئەگەر من دەرمان بخۆم یان نە؟ ئەم وتەیە ڕاستە، بەلام خۆی دەفەوتێ، نەک پزیشک؛ چونکە هۆی مردنی پارێز نەکردنە. پزیشک ڕێنومای بووە، ڕێنوما چ زیان دەبینێ ئەگەر ئەو بمرێ؟ هەر وەکوو نەخۆشی لەش دەبێتە هۆی نەمانی ژینی ئەم دونیایە، نەخۆشی دڵیش دەبێتە هۆی چارەڕەشی پاشەڕۆژ. هەروەها چۆن دەرمان و پارێز هۆی سەلامەتی‌و لەش ساغین، پەرستن‌و ناسین‌و پارێز لە تاوان، هۆی سەلامەت‌و تەندروستی دڵە؛ وَ لا یَنجوا الامن اتی الله بقلب سَلیم.

**ڕەهەندی چوارەم**: ئەمەش نەزانی کەسانێکە بە سەر شەریعەتدا لە ڕوانگەیەکی‌ترەوە. ئەم تاقمە دەڵێن: «شەرع دەفەرمێ دڵ لە تووڕەیی‌و شاوەت‌و دووزمانی پاقژ کەوە و ئەمەش بۆ کەس ناکرێ؛ چونکە مرۆیان لەمانە ئافراندووە و ئەمانەش وەکوو ئەوەیە کەسێک پەلاسێکی ڕەشی بێ‌و بیەوێ سپی کاتەوە. دیارە پەرژانە سەر ئەم کارە، بێهوودەیە». ئەم گێلۆکانە تێنەگەیشتوون‌و نەیانزانیوە دین وای نەوتووە، بەڵکوو وتوویە تووڕەیی‌و شاوەت بێنە ژێر ڕکێفی خۆت‌و کۆتی بەندەگییان بخە گەردەن‌و مەهێلا لە فەرمانی شەریعەت کلا بن‌و لە لووتبەرزی خۆ بپارێزە. ئەمەش دەلوێ‌و زۆر کەسان بەم پاگە گەیشتوون.

پەیغەمبەری خودا نەیفەرموو «تووڕەیی‌و شاوەت نابێ بێت»و بۆ خۆی نۆ ژنی هەبوو و دەیفەرموو: «انا بَشَرٌ اَغضب کما یَغضَبُ البَشَرُ»؛ من مرۆڤم و وەکوو مرۆڤ تووڕە دەبم. خوداش فەرمووی: وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ[4]. خودا پەسنی ئەو کەسانەی دەکرد کە تووڕەیی خۆیان دەخواردەوە نەک ئەوانەی کە تووڕە نەبوون.

**ڕەهەندی پێنجەم**: نەزانی کەسانێکە بە سەر دانستەکانی خودادا کە دەڵێن: «خودای مەزن،

---

١ - (قورئان، ١٨/٣٥) کێش دەیەوێ بە پاکژی بژی، هەرخۆی لەو پاکیە بەهرە دەبا. (هـ)

٢ - (قورئان، ٦/٢٩) هەرکەس دەچێتە خەزایە، خەباتێکە بۆ خۆی دەکا. (هـ).

٣ - (قورئان، ٤٦/٤١) هەرکەسێ کاری چاک دەکا، بۆ خۆی دەکا. (هـ)

٤ - (قورئان، ١٣٤/٣) ڕکی خۆیان دەخۆنەوە و لە مەردوم چاوپۆشی دەکەن. (هـ)

دلۆڤان‌و بەخشندەیە، ئێمە هەر چەشنێک کە بین بەزەیی پێمانا دێت». تێنەگەیشتوون هەروەک دلۆڤانە، لە هەمان کاتدا بە توندی تۆڵە دەستێنێ. نابینن کە چەندەها خەڵکی تووشی بەڵاو نەهامەتی کردووە لەم دونیایەدا. مەگەر تێنەگەیشتوون تا بازرگانی نەکەن سامان بە دەست ناهێنن‌و تا تێنەکۆشن زانست فێر نابن؛ دیارە ئەمانە لە کۆکردنەوەی ساماندا قەد کۆڵ نادەن‌و ناڵێن خوا دەهەندەیە و بێ بازرگانی سامانمان دەداتێ. ئەمە لە کاتێک دایە کە خودا دەفەرمێ: وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا[1]، ڕۆزی مسۆگەر کردووە و دەفەرمێ:وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ[2]. چونکە بڕوایان بە بەخشندەیی پەروەردگار نییە، لە کۆکردنەوەی سامان کۆڵ نادەن، ئەوەش لە مەڕ ڕۆژی پەسلان دەیلێن سەرزارەکییە و شەیتان دەیخاتە دڵیانەوە و بێ بنەمایە.

**ڕەهەندی شەشم**: نەزانی ئەوانەیە بە خۆیان خەڕەن؛ لووتبەرزیان لەوەدایە کە دەڵێن «ئێمە گەیشتووینە ئاستێک کە سووچ‌و تاوان زیانێکی بۆمان نییە و دینی ئێمە بۆتە هەمانەی گەورەی پڕ لە ئاو و پیسی، پیسی ناکات». زۆربەی ئەم ساویلکانە ئەوندە بێقیمەتن کە گەر کەسێک لە پەیڤێکدا ڕێزیان نەگرێ، یاخۆ شان بدا لە شانیان تا ئەو کاتەی لە کۆڵی دونیا دەبنەوە، خەریکی دوژمنی ئەو کەسە دەبن‌و لە ئازاری هەدا نادەن. ئەگەر پارووبەک - کە چاوی تەماعیان لێیە - لە بەریان هەڵگیرێ، جیهانیان لە بەر چاو تەنگ‌و تاریک دەبێ. ئەم بەدفەڕانە کە هێشتا نەبوونەتە پیاوێکی پیاوانە، کەی ئەم فڕوفیشاڵەیان ڕاستە؟ ئەگەر کەسێکیش وای لێهات کە تووڕەیی‌و شاوەت توخنی نەکەوت، هەر لەم سۆنگەوە توشی لووتبەرزی دێ. چونکە خۆ ڕادەی ئەم لە ڕادەی پێغەمبەران تێناپەڕێ، کەچی پێغەمبەران بە بۆنەی سووچ‌و تاوانێکەوە دەگریان‌و دەپاڕانەوە و داوای لێبوردنیان لە خوا دەکرد. پاکان‌و یارانی پێغەمبەر لە گوناح و تاوانی بچووکیش خۆیان دەپاراست؛ تەنانەت لە ترسی شوبهە چشیان لە حەڵالیش دەکرد. کەواتە ئەم نەزانە، چۆن وا تێگەیشتووە شەیتان نەڕۆیشتووەتە کەولێ‌و لە ڕادەی خاسان تێپەڕیوە؟ ئەگەریش بڵێ «پێغەمبەرانیش هەر ئاوەها بوون‌و بە بۆنەی خەڵکەوە ئاوەهایان دەکرد»، دەیجا بڵێ ئەی تۆ بۆچی وەکوو ئەوان ناکەی؟ کە هەرکەسە ئەو دەبینێ تووشی زیان دەبێ. ئەگەر وتی «زیانی خەڵکی زیانی من نییە»، دەیجا بۆچی بۆ پێغەمبەر زیانی بوو؟ ئەگەر زیانی نەبوو بۆچی ئەوەندە خۆی دەخستە نێو ئازاری پارێزکاری‌و چشی لە خورمایەکی بەیتولماڵ دەکرد؟ ئەگەر بیخواردایە چ خەسارێکی دەدا لە خەڵکی؟ چونکە هەرکەس دەیتوانی بیخوا. ئەگەر دانە خورمایەکی بەیتولماڵ خواردنی تا ئەم ڕادەیە بۆ پەیغەمبەری خودا

---

١ - (قورئان، ٦/١١) لەم زەمینە هەر شتێ دەجوولێتەوە گشتی ڕۆزی لەسەر خوایە. (هـ)

٢ - (قورئان، ٣٩/٥٣) مرۆ بۆ خۆی خەبات نەکا، هیچ پاداشتێکی پێ ناگا. (هـ)

سووچو تاوانە، چۆن خواردنەوەی شەراو بۆ تۆ گوناح نییە؟ ڕاستە ڕادەی ئـەمو پێغەمبـەر ناگاتـە یـەک، بەلام خواردنی خورمایەکو شەرابیش ناگاتە یەک. چۆن یەک دانـە خورمـا پێغەمبـەر لـە نـوێژ دەبـا، کەچی سەد پێمانە شەراب هیچ لە ئەو ناکات. دیارە خۆی کردۆتە گـەپجاڕی شـەیتان، ئـەگینا کـەی ژیران‌و پیاوماقوولان بایەخ بە قسەی دەدەن.

**ڕەهەندی حەوتەم:** ئەمجار بەهۆی شاوەت و گوێ‌پێ‌نەدانە، نەک نەزانی. ئەمە پیشەی کەسانێکە کە لەم شوبهەی ڕابردووانە هیچ ئاگادار نین، بەلام تاقمێک دەبینن کە بە سەر ئەم شێوازەوە دەڕۆن و تاوان دەکەن و پەیڤی ڕازاوە دەلێن و خۆ بە سۆفی و پیاوی خوا دەزانن و بەرگی ئەوان لەبەر دەکەن. ئەمانەش هۆگری ئەم ئاکارە دەبن، چونکە شاوەت و تەوەزلی ئاوێتەیە. ئیزن نادەنە خۆیان تاوان بکەن دەلێن:«لەم سۆنگەوە سزا دەدرێین»، ئەو دەم چێژی تاوانیان لەسەر زار تفت و تالە؛ بەلام ئێستا دەلێن: «ئەمانە خۆ... تاوان نییە، ئەمانە هەمووی تۆمەت و هەلبەستراوە». جا نە لە واتای تۆمەت گەیشتوون نە هەلبەستراو. ئەمە تایبەتمەندی پیاوێکی گێلۆکە و نەزان و شاوەتی و شەیتان لە کەولە و بە وتە و پەیڤیش ڕێگا دەر ناکات؛ چونکە شوبهەی وی لە سۆنگەی پەیڤەوە نییە. زۆربەی ئەم خێلە لەم چەشنەن، بۆیە خوداش فەرمووی: «إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا[1] ;وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا[2]». کەواتە بزووتنەوە دەگەل ئەمانە بە شیر کاریگەرترە تا بە قسە.

ئەمەی بێژرا بەستە بۆ ڕسوایی ئەهلی ئەباحـەت. لـەم سـەردێرەدا بـاس لـەوە کـرا کـە هـۆی ئـەم سەرلێشێوانانە یا لە خۆ نەگەیشتنە، یا خوانەناسینە، یا ڕێگەی خۆ تـا خـوا نـەزانین کـە پێـی دەلـێن شەریعەت. کە لە کارێکدا نەزانی بوو بە هوی وەرگرتنی چێژ و حەز، گران لە کۆل بێتـەوە؛ بـۆ ئەوەیـە تاقمێک بە بێ هیچ شوبهەیەک دەکەونە دووی ڕێ‌لێ‌تێکچـووان و دەلـێن: «ئێمـە حـەیرانین». کـە لێیان بپرسی حەیرانی چی، هیچ پەرسڤت نادەنەوە. چونکە ئەمانە نـە شـوبهەیـان بـۆ هاتۆتـە ئـاراوە، نەش خوازیاری گەیشتن بە ڕاستەقینەن. ئەمانە وەکوو ئەو کەسەن کـە بڕواتـە لای پزیـشک و بـلێت نەخۆشم، بەلام نەلێ چ نەخۆشییەک. دیارە بەبێ زانینی دەرد، دەرمان بێ‌واتایـە. باشـتر ئەوەیـە کـە بەم کەسە بلێن: «لە هەرچی پێت خۆشە حەیران بە، بەلام لەمەی کە تۆ ئافرێندراوی و ئافرێنەری تـۆ

---

١- قورئان (١٨/٥٧) ئێمە پەردەن بەسەر دلیان هەلکێشاوە کە تێ‌نەگەن؛ گوێیشمان هێندە گران کردوون کە نەبیسن چەند بکۆشی شارەزانی ڕێگەیان بکەی، هەرگیز بۆت ناکەونە سەر ڕێ. (هـ)

٢- قورئان (١٧/٤٦) هەرگا لە قورئانەکەدا ناوی پەروەردندەی تاکت بەدەمدا دێ، بەقینەوە پشت هەلدەکەن. (هـ)

توانا و زانایە و هەرچی بهەوێ دەتوانێ جێبەجێ بکا، دڕدۆنگ مەبە.» بە بەڵگەوەبۆی ڕوون بکەنەوە، بەو جۆرەی کە پێشتر بێژرا.

## سەردێڕی سێهەم: لە ناسینی دونیادا

### بەشی یەکەم: هۆی بوونی مرۆڤ لە دونیادا

باش بزانە دونیا هەوارێکە لە هەوارگەکانی ڕێگای دین، ڕێگای بگارێکە ڕێبواران دەگەیێنێتە پەروەرێنەری خۆیان و بازارێکی ڕازاوەیە لەسەر ڕێگای مەنزڵگادا، تا ڕێبواران توێشووی ڕێگای لێ وەرگرن.

دونیا و دوارۆژ بریتین لە دو دۆخ: ئەوەی بەر لە مردن کە دونیای پێ دەڵێن و لێت نزیکترە؛ ئەوەی پاش مردن کە پێ دەڵێن ئاخیرەت یان دوارۆژ.

مەبەست لە دونیا هەڵگرتنی توێشووی دوارۆژە؛ مرۆڤ لە سەرەتای ئافراندنیدا نوقسان و ساکارە، کەچی ئەو هێز و توانەی پێ دراوە بەرەو تەواوتر بوون بڕوا و نەخشی فریشتەکان لەسەر دڵی خۆی ببینێتەوە، بە جۆرێک کە شیاوی بەر بارەگای پەروەرێنەری بێ؛ واتە: وای لێ بێ کە سەیری سیمای خودای خۆی بکا.

ئەوپەڕی بەختەوەری مرۆڤ گەیشتن بەم ئاستەیە؛ واتە دیتنی جەمالی پەروەردگار. دیارە ناتوانێ ببێتە بینەری خودا مەگین ئەوەی چاوی بکرێتەوە و ئەو جوانی جوانکارە هەست پێبکا؛ ئەوەش بە ناسینی دێتە دەست. کلیلی ناسینی جوانی خودا، ناسینی کردەوە سەیر و سەمەرەکانی ویە. کلیلی گەیشتن لەم کردەوانە، هەوەڵجار هەستەکانی مرۆڤە و ئەم هەستانەش هێز و ورەیان لەم جەندەکە لە قوڕ پێچراوەدایە.

بۆیە ناردرایە نێو ئەم جیهانی ئاو و خاکە تا توێشووی ڕێگای پڕ لە هەورازی هەڵبگرێ و لە سۆنگەی ناسینی خۆی و تێگەیشتن لە جوانکارییەکانی پەروەردەگاری لە جیهاندا، چاوی دڵی بە سەر سیمای بینایی چاوان بکرێتەوە. تا ئەم هەستانەی دەگەڵ بن و سیخوڕی بکەن و هەواڵی بۆ ڕاگوێزنەوە، دەڵێن «لەو دونیایە» و کاتێ مالاویی لەم هەستانەی کرد و خۆی مایەوە و دانستەکانی زاتی وی، دەڵێن: «بۆ ئاخیرەت ڕۆیشتووە».

کەواتە هۆی بوونی لە دونیا ئەمەیە.

**بەشی دووهەم: ڕاستەقینە و زیان و مەبەستی دونیا**

لە دونیادا دوو شت پێویستە: یەکەم، دڵ لە فەوتێنەرانی بپارێزی و پێخۆری وی دابین بکا؛ دووەم لەش لەوانەی دەیفەوتێنن بپارێزی و خۆراکی تەیار بکا.

خۆراکی دڵ ناسین و خۆشەویستی پەروەردگارە؛ دیارە خۆراکی هەرشتێک بە گوێرەی چێژی وییە، کە ئەوەش دانستەی ئەوە. پێشتر ڕوون کرایەوە کە ئەمە تایبەتمەندی مرۆڤە. هۆی فەوتانی دڵی مرۆڤ، هۆگربوون بە کەسێک بێجگە لە خوایە. لەشیش دەبێ سەر بۆ دڵ نەوی کا، چونکی دڵ هەتاهەتاییە و لەش کەمتەمەن. لەش بۆ دڵ وەکوو وشترە بۆ حاجی لە ڕێگای حەجدا. هەرچەند دەبێ حاجی خزمەتی وشترەکەی بکا، بە ئاوودان بەخێوی کا تا بە سەلامەت بگاتە حەج، بەلام نابێ هەموو خێی بداتە وشترەکەی؛ بەڵکوو بەو ڕادەی کە گەرەکە[1]، ئاگاداری بێ. دیارە ئەگەر هەموو دەم خەریک ئاوودانی حوشترەکەی بێ و خەریکی ڕازاندنەوەی بێ، لە کاروان جێدەمێنێ و دەفەوتێ. هەروایە مرۆڤیش ئەگەر هەموو دەم خەریکی پەرای لەش بێ و لە خەساری بپارێزێ، ئاگای لە دڵ دەبڕێ و ڕێگای بەختەوەری بزر دەکا.

گەرەکی لەش لە دونیا سێشتە و بەس: پێخۆرە و پۆشەن و خانوو. پێخۆر بۆ خواردنە و پۆشەن و خانوو بۆ بەرەنگاری لە سەرما و گەرما.

کەواتە پێویستی مرۆڤ لە دونیا بۆ لەش بێجگە لەمە نییە؛ بەڵکوو بنەمای دونیا هەر ئەمەیە. خۆراکی دڵناسینە و هەرچەندە زۆرتر بێ باشترە. خۆراکی لەش پێخۆرە و ئەگەر لە ڕادەی خۆی بەدەر بێ، دەبێتە هۆی فەوتانی لەش. پەروەرێنەری مەزن شاوەتی کردۆتە دنەدەری مرۆڤ تا بکەوێتە دووی خواردن و پۆشەن و خانوو، تا لەشی - کە چارەوایەکی خۆشبەزە بۆی - نەفەوتێ. شاوەت بە چەشنێک ڕسکاوە بەوەی هەیەتی سەبووری نایە و داوای زۆرتر دەکا. ئاوەزیش نێردراوە تا شاوەت لە ڕادەی خۆی ڕابگرێ و شەریعەتیشی لە زمانی پێغەمبەرانەوە ناردووە تا سنووری لەش ڕوون بکەنەوە. بەلام ئەم شاوەتەی لە سەرەتای منداڵیدا خولقاندووە و ئاوەزی دوای وی ئافراندووە. کەواتە شاوەت پێشتر هاتووە و سەقامگیر بووە و سەربزێوی دەست پێکردووە بە سەر ئاوەز و شەرعدا کە دوای وی هاتوون و هاتوون تا نەهێڵن هەموو کات و ساتی خەریکی کۆ کردنەوەی خۆراک و پۆشەن و خانوو بێ و خۆی لە بیر بباتەوە و نەزانێ ڕاستەقینەی خواردن و بەرگ چییە و هۆی هاتنی

---

[1] - گەرەکە- پێویستە.

بۆ نێو دونیا چ بووە و زادی دوارۆژی لە بیر کا.

لەم پەیڤە، ڕاستەقینەی دونیا و زیان و مەبەستی بۆت ڕوون کرایەوە و ئێستا دەبێ لقەکان و پیشەکانی دونیا بناسی.

**بەشی سێهەم: بنەمای دونیا- پێخۆر و بەرگ و خانوو**

باش بزانە کە لە دونیا ورد بیتەوە، تێدەگەی کە دونیا بریتییە لە سێ شت: **یەکەم** ئەو شتە دیارانەی کە لەسەر زەویدان؛ وەکوو ڕوەک و کانەکان و گیانداران. لەڕاستیدا زەوی بۆ سەرپەنا و قازانجی کشتوکاڵە، کانەکان - وەکوو ئاسن و برنجە - بۆ ئامێر چێ کردن و ئاژەڵان بۆ سواری و خواردنن. مرۆڤیش لەشی و دڵی پەرژاندۆتە سەر ئەمانە؛ جا یا خۆ دڵی بۆتە هۆگر و گراوی دونیا، یا خۆ لەشی بەرژاندۆتە سەر ڕێکوپێک کردنی کارەکانی دونیا.

دڵێ کە بوو بە هۆگری دونیا و خەریکی خۆشویستنی وی بوو، چەن دانستەی تووشیار دەبێ، کە دەبنە هۆی فەوتانی؛ وەکوو بەخیلی و چاوچنۆکی و چاونەزێری[1] و دوژمنی و هتد. لە خەریک کردنی لەش بە دونیاوە، دڵیش دەبێتە هۆگری دونیا و خۆی لە بیر دەکا و بەردەوام دەکەوێتە سەر کاری دونیا.

هەروەک بناخەی دونیا سێشتە (خۆراک، پۆشەن و خانوو) پیشەکانیش -کە گەرەکی ژینی مرۆڤن- سێشتن: جووتیاری و جۆلایی و نژیارڤانی[2]. بەڵام هەریەک لەمانە چەن لقی هەیە کە هەندێکیان ئامادەی دەکەن وەکوو هەلاج و تەشیڕیس کە فرێت چێدەکەن؛ هەندێکیش وەکوو بەرگدوور کە کاری دوایین جێبەجێ دەکەن. هەموو ئەمانەش پێویستیان بە ئامراز هەیە کە لە دار و ئاسن و پێست دروست دەکرێن. کەواتە ئاسنگەر و دارتاش و پێستە خوشکەر.

کە هەموو ئەمانەش کۆوە بوون، پێویستیان بە ئاریکاری یەکە، چونکی کەس بە تەنیا هەموو کاری بۆ بەڕێوە ناچێ. کەواتە لە نێوانی ئەمانە پێوەندیگەلێک پێکهات کە بوو بە هۆی دوژمنایەتی؛ چونکە هەرکەس بەوەی هەیبوو قنیاتی[3] نەدەکرد و چاوی دەبڕیە کەسانی‌تر. بۆیە سێ پیشەی‌تریش پێویست بوون: یەکەم پیشەی سیاسەت و پادشایی، دووەم پیشەی دادوەری حکوومەت، سێهەم پیشەی فیقەکە بەهۆی ئەوەوە پێوەندی نێوان خەڵکی ڕوون کەنەوە. هەریەک لەمانەش پیشەیەکن، هەرچەند بە دەست جێبەجێ نابن.

---

1. چاونەزێر: رژد، دەس‌قووچاو.
2. نژیارڤان: ئەندازیاری خانوان.
3. قنیات: قەناعەت، چاودێری.

بەم چەشنە پیشەکان لە دونیادا زۆر بوون و خەڵکی تێیاندا بزر بوون و لە بیریان کرد کە هۆی سەرەکی هەمووی ئەمانە سێ شتە و لەوە بەو لاوە هیچ هەر نییە: پێخۆر و پۆشەن و خانوو. ئەم هەمووە بۆ ئەم سێیەن، ئەم سێیەش بۆ لەشن، لەشیش بۆ دڵە و دڵیش بۆ پەروەردگار. جا خۆیان و خوایان لە بیر کرد وەکی ئەو حاجییەی خۆی و کەعبە و سەفەری لە بیر کرد بۆ پەرا و خزمەتی حوشترەکەی.

دونیا و ڕاستەقینەی دونیا هەر ئەمەیە بێژرا. هەرکەس تێیدا ڕاوەستاو نەبێ و کاری بە ئەنجام نەگەیاندبێ وکۆشەوەی بۆ دوارۆژ دانەنابێ و زۆرتر لە ڕادەی پێویست پەرژابێتە سەر کار و باری، دونیای نەناسیوە و لێی تێنەگیشتووە. بۆیە پێغەمبەری خوداش فەرمووی: «دونیا سیحربازترە لە هارووت و مارووت، لێی بە ئاگا بن». کە دونیا ئەوەندە سیحرباز بوو، گەرەکە لەمەرایی و فرۆفێڵی بە ئاگا بن و چۆنیەتی کردەوەکانی لە خەڵکی خویان کەن. کەواتە، ئێستا با بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەبەستە وێنەکانی پیشان بدەین.

**بەشی چوارەم**: **چەن نموونەیەک لە سیحری دونیا و بێئاگایی هۆگرانی دونیا**

وێنەی **یەکەم**: بزانە دونیا وا خۆیت پێ دەنوێنێ کە هەردەم پێت وایە لە لاتە و بەبێجووڵە، ئۆقرەی لە لات گرتووە، لە کاتێکدا هەردەم خەریکە لێت دوور دەبێتەوە و بەجێتدێڵێ. ئەمە وەکوو سێبەرە؛ کەتێیدا ڕادەمێنی پێت وایە نابزوێ، کەچی بەردەوام خەریکی ڕۆیشتنە. دیارە تەمەنی تۆش هەروایە: بەردەوام دەڕوا و هەردەم کورتتر دەبێتەوە. ئەوە دونیایە کە لێت هەڵدێ و مالاواییت لێ دەکا و تۆش لێی بێخەبەری.

**وێنەیەکیتر**: سیحری وی وەکوو کەسێکە کە سەرەتا لێت وەکوو دۆستێکی گیانیبەگیانی دێتە پێشەوە و بەڵێنت پێ دەدا کە قەد بەجێتناهێڵێ و یار و هاودەمت دەمێنێ؛ کەچی لەپڕ دەبینی تۆ بە جێ دێڵێ و دەڕواتە ئامێزی دوژمنت؛ ئەمە وەکوو ژنێکی خراپکارە کە پیاوان دەخاپێنێ و هۆگری خۆی دەکاتن. پاشان دەیانباتەوە ماڵ و دەیانکوژێ.

عیسا -سەلامی خوای لەسەر- لە موکاشفاتی خۆیدا دونیای بینی لە ڕواڵەتی پیرەژنێکدا. وتی: «چەن مێردت بووە؟» وتی: «لە وتن نایە». وتی: «مردن یان لێیان جودا بوویتەوە؟» وتی: «نە؛ هەموویانم کوشتووە». وتی: «کەواتە زۆر سەیرن ئەو گێلۆکانەی دەبینن چت بە ڕابردووان کردووە و دیسان هۆگرت دەبن و خۆیان دەهاوێژنە داوت».

**وێنەیەکیتر**: سیحری دونیا ئەوەیە کە خۆی دەڕازێنێ و هەرچی دەرد و مەینەتە دادەپۆشێ، تا نەزان هۆگری بێ و فریوی بخوا. ئەمە چیرۆکی ژنێکی پیری دزێوە کە بە بەرگی ئاوریشم و زێڕ و

**کیمیای بەختەوەری**

زیوی جوان خۆی دەخەملێنێ و هەرزەکاران فریو دەدا و دەیانکاتە گراوی خۆی. جا کە ڕووبەندی لە ڕوو لادا هەمووان پەژیوان و شەرمەسار و دەم بە جنێو دەمێننەوە.

لە ئەخباردا هاتووە کە لە ڕۆژی پەسلاندا دونیا دێنن لە بیچمی پیرەژنێکی دزێوی چاوکەسکی بێ ددانداو کاتێ خەڵکی سەیری دەکەن، دەڵێن: «پەنا دەبەینە بەر خودا! ئەمە چییە بەم دزێوی و ناحەزییە؟» دەڵێن: «ئەمە دونیایە کە بە بۆنەی وی دەگەڵ یەک دوژمنیتان کرد و خوێنی یەکتان ڕشت و لە خزمانتان دابڕان و پێی خەرە بوون». دەفەرمێ کە دەگەڵ ئەمانە، ئەویش بهاوێژنە دۆزەخەوە.

**وێنەیەکیتر**: کەسێک کە حسێب کات بۆ خۆی کە لە ئەزەڵەوە چەن لە دونیا نەبووە و لە ئەبەددا چەن لە دونیا نابێ، ئەم چەن ڕۆژەی کە لە دونیایە، ماوەیەکی کورتە لە نێوان ئەبەد و ئەزەلدا. دەزانێ کە دونیا وەکوو ڕێگای ڕێبگارێکە کە سەرەتای لانکە و ئەنجامی بەردی لەحەد؛ لەو نێوانەدا چەن مەنزڵگایەکە، هەرساڵ وەکی هەوارێکە و هەرمانگ وەکوو فرسەنگێکە و هەر ڕۆژ دیاردەیەکە و هەر هەناسەش هەنگاوێکە و ئەویش بەردەوامە. لەم ڕێگایە یەکێک زۆری ماوە و یەکێک هەوارێک و یەکێک دیاردەیەک و یەکێک کەم و یەکێک زۆر؛ ئەویش وا جێی داکوتاوە وەکوو ئەوەی قەد لەم جێگا نابزوێ: وا کارەکان دادەڕێژێ کە بۆ دەیانساڵیتر چ بکا، بێئاگا لەوەی سبەی دوو سبەی دەڕاوتە ژێر گڵەوە.

**وێنەیەکیتر**: هۆگرانی دونیا لە چێژێکدا کە دەیبەن وەکوو ئەوەیە کە کەسێک تا دەتوانێ خۆراکی چەور و شیرین و بەتام دەخوا، تا ئەوەی گەدەی دەفەوتێ، ئەودەم بۆنێکی گەن و ناخۆش لە ورگ و زار و نیشتنگەی خۆی دەبیسێ کە شەرمەسار و ڕووزەردی دەکا و چێژ دوایی دێ، کەچی ڕسوایی هەر دەمێنێ.

بە چەشنێک پارووەیەک هەرچەند خۆشتر، پیسایی زۆرتر؛ هەرچەند چێژی دونیا زۆرتر، دوارۆژی ڕیسواترە و ئەمەش لە کاتی سەرەمەرگدا ئاشکرا ئەبێ؛ ئەوەی باخ و بێسان و کارەکەر و نۆکەر و زێڕ و زیوی زۆرتر بێ، لە گیانەلادا ڕەنج و ئازاری زۆرتر لەو کەسەیە سامانی کەمە. ئەو ڕەنج و ئازارەش بە مردن دوایی نایە، بەڵکوو زۆرتر دەبێ؛ چونکە ئەو گراوییە دانستەی دڵە و دڵیش بە مردن نامرێ و هەروا دەمێنێ.

**وێنەیەکیتر**: باش بزانە، کاتێ کارێکی دونیایی هاتە گۆڕێ، خەڵکی لایان وایە زۆر نابا و زوو دەگاتە کۆتایی، کەچی لە هەر کارێکی بچووکدا سەدکاری گەورەتر دروست دەبێ و پۆ دەداتەوە و زۆر دەخایەنێ. عیسا دەڵێ: «ئەوانەی هۆگری دونیان وەکوو ئەو کەسەیە لە ئاوی سوێری زەریا دەخواتەوە و قەد تێرئاو نابێ و هەر دەخواتەوە، تا لە ئەنجامدا دەمرێ و چجار تینوویەتی ناشکێ».

پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمێ: «هەروەکوو چۆن کەس نییە لە ئاو بدا و قولەپێی تەڕ نەبێ، کەسیش نییە تێکەڵاوی دونیا بێ و پیس نەبێ».

**وێنەیەکی‌تر**: سەربهوردی ئەو کەسەی دێتە نێو دونیاوە، چیرۆکی ئەو کەسەیە کە دەبێتە میوان لە لای خاوەن‌ماڵێک کە هەموو کات خووخدەی وا بووە کە خانووی ڕازاوە بێ بۆ میوانان و بانگهێشتنیان کا. یەک بە یەک میوانان دێنە سەر ئەم خوانە و لە بەرامبەریان مەجمەیەکی گەورەی زێڕین ڕادەنێن، لە نێو مەجمەکەدا عوودیان داناوە تا دایگرسێنن و خۆیان بۆن‌خوش کەن. جا ئەوەی ژیر و تێگەیشتوو بێ، لە نوقڵ و نەباتی نێو مەجمەکە دەخوا و عوودێک دادەگرسێنێ و خۆی تێر و تەسەل و بۆنخۆش دەکا و بە شوکرانەبژێرییەوە ئەو خانییە بەجێ‌دێڵێ. بەڵام پیاوی گێل و نەزان پێی وایە ئەو سفرە و خوانە هی وییە، دەبێ لەگەڵ خۆی بیبا. کاتی ماڵاوایی مەجمە زێڕینەکە لە باخەڵی دەنێ و دەڕوا. کە لەبەر دەرگا مەجمەکەی لێ دەستێنن، زیز و تووڕە دەبێ. جا کەسی برای! دونیاش کاروانسەرایەکە لەسەر ڕێگای ڕێبگاراندا، دەبێ تویشووی ڕێگا هەڵبگری و تەما لەو شتانەی کاروانسەرا نەکەی.

**وێنەیەکی‌تر**: باسی ئەوانەی دەپەرژێنە سەر دونیا و ئاگایان لە دوارۆژ دەبڕێ، چیرۆکی ئەو کەسانەیە لە نێو گەمیەیەکدا دەگەن بە جزیرەیەک و بۆ خۆ خاوێن‌کردنەوە دادەبەزن. گەمیەوان[1] بانگ دەکا: بە ئاگا بن کەس بە جێ نەمێنێ و خێرا وەرنەوە و خۆ مەپەرژێننە سەر هیچ شتەک. تاقمێک بە خێرا خۆ پاقژ دەکەن و دەگەڕنەوە نێو گەمیە و لە شوێنێکی باشدا جێ‌دەگرن. تاقمێک نوقمی جوانییەکانی جزیرە دەبن و درەنگتر دەڕۆنەوە. کە دێنەوە نێو گەمیە، هەموو شوێنە باشەکان بەگیراوی دەبینن و بە ناچار لە شوێنێکی تەنگ و تاریکدا دادەنیشن. تاقمێکی‌تر زۆرتر نوقمی جوانیەکانی جزیرە دەبن و پاش ماوەیەکی باش سووڕانەوە بە جزیرەدا، زۆرێک بەردی ئاڵ و واڵای جوان کۆ دەکەنەوە و لە نێو توورەکەیەکی دەهاوێژن و لە کۆڵی دەگرن و دەگەڕنەوە نێو گەمیە. جا هیچ جێگا بۆ خۆیان نابیننەوە، کۆڵ لە ئەستۆ لە سووچێکی تەنگ و تاریک سەقام دەگرن. پاش ماوەیەک بەردە جوانەکان ڕەنگیان دەگۆڕن و جوانییەکەیان نامێنێ و ئەمانیش بەناچار تا دوایی‌سەفەر ئەو کۆڵە بێ‌کەڵکە لە ئەستۆ دەگرن. تاقمێکی‌تر هەر بە تەواوی ئاگا لە خۆیان دەبڕن و نوقمی جوانییەکانی جزیرە دەبن و دەنگی گەمیەوان نابیسن و بەجێ‌دەمێنن و هەندێ لە برسان و هەندێ لە ترسان گیان دەدەنە دەستەوە.

تاقمی ئەوەڵ وەکی بڕوادارانی پارێزکارن، دوایین‌تاقمیش ئەوانەن کە خۆیان و خودایان و

---

[1] - گەمیەوان- ناخودای کەشتی.

دوارۆژیان لەگەڵ زێڕ و زیوی دونیا گۆڕاوە و تووشی خەسار بـوون «ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ »[1]. ئەم دوو تاقمەی ناونجیش ئەوکەسانەن کە بڕوایان لە دەست نەدا، بـەڵام تووشـی دونیادۆسـتی و زیان و خەسار بوون. هەندێکیان بە نەداریوە خۆشیان ڕابوارد، تاقمێکیشیان بە سـامانەوە ڕایـانبوارد تـا باری سەفەریان گران بوو.

## بەشی پێنجەم: وا نییە کە هەرچی لە دونیا بێ دزێوە

بەم باسانەی کە لەمەڕ دونیا بێژرا، پێت وانەبێ هەرچی لە دونیایە، دزێو و ناحەزە، بەڵکوو لە دونیـادا شتی زۆر هەیە کە هی دونیا نییە. وەکوو زانست و کردەوە کە لە دونیان و هی دونیا نین و بە هاواڵـی مرۆڤ لەگەڵی دەڕۆنە ئەو دونیا: زانست بە ڕاشکاوی دەگەڵی دەمێنـێ؛ بـەڵام کـردەوە هەرچەنـد بـە ئاشکرا دیار نییە، ئاسەوارەکانی دەمێنن، ئەمەش دوو بەشە: **یەکەم**، پاکی و پاراوی گەوهەری دڵە کـە لە سۆنگەی پشت لە سووچ و تاوان کردن دێتە دەست. **دووهەم**، هۆگر بوون بـە یـادی خـودا کـە لـە چاوەدێری بەسەر عیبادەتەوە دێتە دەست. کەواتە ئەمانـە هـەردوویان «باقیـات الـصالحات»ن، بۆیـە خوداش فەرمووی: «وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا»[2].

خۆشی زانین و گازە و تکا و سـکاڵا و هـۆگری لەگـەڵ یـادی پـەروەدگار، لـە هـەموو خۆشـییەکان زۆرترە. کەواتە هـەموو چێژەکـان دزێـو نـین؛ بەڵـکوو خۆشـییەک کـە ڕابـووڕێ و نـەمێنی ناحـەزە؛ هەرچەند، ئەو خۆشیانەش خۆیان دوو دەستەن: **یەکەم** ئەوەیە کە هەرچەند هی دونیایە و پاش مـردن نامێنێ، بەڵام لە خزمەت، کاری دوارۆژ و کۆوەکردنی زانست و کردەوەی چـاک و زۆروزەوەنـدکـردنی بڕوادارنە؛ وەکوو خواردن و ژنهێنان و پۆشەن و خانوویەک کە بە قەدەر نیاز بێ، ئەمە مەرجی ڕێگـای پەسلانە: هەرکەس لە دونیا بەم ڕادەیە قنیاتی کرد و مەبەستی لەوەش، بەردەوامی و قـایم بـوون بـوو لە سەر ڕێبازی دین، ئەو کەسە لە هۆگرانی دونیا نییە.

کەواتە دزێوی ئەم دونیایە، ئەوەیە کە مرۆڤ هۆگری ئەو شتە بێ و ئاگای لە دیـن و دوارۆژ نـەمێنێ، ئەمە دەبێتە هۆی ڕقوقین لەو دونیا و هۆگری ئەم دونیا. بۆیـە پەیغەمبـەری خـودا فـەرمووی «الدنیا ملعُونةٌ، وَ ملعُونٌ فیها، الّا ذکرُ الله وَ ما والاهُ». فەرمووی: دونیا و ئەوەی تێیدایە مەلعوونن، مـەگین یـادی خودا و ئەوەی پێوەندی بە یادی خوداوە بێ. ئەم ڕادەیـە لـە ڕاڤـەی دونیـا لـەم بەشـەدا بەسـتە و لـە چارەکی سێهەم، بنەماکانی موعامیلەدا زۆرتر لێی ورد دەبینەوە.

---

١- قورئان (١٠٧/١٦) گوزەرانی سەردنیایان لە دوارۆژ پتر خۆش دەوێ. (هـ)

٢- قورئان (٧٦/١٩) پەروەرندەت بۆ خێرێ دەمێنێتەوە پاداشی باشتری هەیە. (هـ)

## سەردێڕی چوارەم: لە ناسینی دوارۆژدا

### بەشی یەکەم: بەهەشت و دۆژەهی جەستەیی و گیانی

کەسی برای! ئەمە بزانە کە کـەس ڕاسـتەقینەی دوارۆژ ناناسـێ، مـەگین ئـەوەی لـە ڕاسـتەقینەی مردن بگات. تا ڕاستەقینەی ژیان نەناسێ، لە ڕاستی مردنیش ناگات. مرۆڤ بە بـێ ناسـینی ڕۆح، لـە ژین هیچ نازانێ و ناسینی ڕاستەقینەی ڕۆح، ناسینی ڕاستەقینەی خۆوە. پێشتر بەشێ لـەم باسـەمان خستە بەرچاو.

گوتمان کە مرۆڤ تێکەڵاوێکە لە دوو بەش: یەکەم گیـان و دووهـەم لـەش. گیـان، سـوارە و لـەش چارەوا. گیان لە دوارۆژا دەگەڵ لەش، بەهەشت و دۆژەهێکی هەیە و بـە تـەنیا خۆشـی بـارودۆخێکی هەیە، بێئەوەی لەشی تێدا بەشدار بێ و بەختەوەری یان چارەڕەشییەکی چاوەڕێیە. ئێمە بـە خۆشـی و بەختەوەری دڵ، بەبێ لەش، دەڵێین بەهەشتی ڕۆحانی و بە ڕەنج و سزا و ئـازارێ کـە لەشـی تێـدا بەشدار نەبێ دەڵێن دۆژەهی ڕۆحانی. بەڵام بەهەشت و دۆژەهێک کە لەشـیش بەشـداری بـێ، ئـەوە خۆی ڕواڵەتییە و ئەنجامی ڕووبار و دار و حوور و کۆشـک و خـواردن و خواردنەوەیـە لـە بەهەشـتدا و ئاور و مار و دووپشک و ئازارە لە دۆزەخدا. باسی ئەم دووانە لە قورئـان و ئـەخباردا بـە تێـر و تەسـەلی بێژراوە و لە هەمووکەس خویان بووە. بە وردی لە کتێبی «احیـا» بەشـی «یـادی مـردن»دا لەسـەری باسمان کردووە. بۆیە لێرە بـە کـورتی ڕاڤـەی ڕاسـتەقینەی مـردن و بەهەشـت و دۆزەخـی ڕۆحـانی دەکەین.

ئەمەی کە خودا فەرمووی: «أَعدَدْتُ لِعبادیَ الصالحین ما لا عـین رأتْ وَ لا أُذُنٌ سَـمِعَتْ و لا خَطَـرَ عَلـی

قلْبِ بَشَرٍ[1]» لە بەهەشتی ڕۆحانیدایە. لە دڵەوە ڕۆچنەیەک هەیە بۆ جیهانی دوارۆژ، کە لـەم مـەزدەوە[2] واتاکان ئاشکرا دەبن و هیچ لێلییەک نامێنێ. کەسێک کە ئەم ڕێگایـەی بـۆئـاوەڵا بـێ، دڵـنیاییەکی قووڵی لەسەر بەختەوەری و چارەڕەشی دوارۆژ بـۆی دێتـە دی، نـە بـە کەوتنـە دووی وادە و بەڵـێن، بەڵکوو بە چاوی دڵ دەیبینن. هەر وەکوو چۆن بژیشک دەزانێ کـە لـەش، لـەش‌سـاغی و نەخۆشـی هەیە لەم جیهانەدا و بۆ ئەمانەش هۆکاری وەکوو دەرمان و پارێز هەیە بۆ لـەش سـاغی و زۆر خـواردن و پارێز نەکردن هەیە بـۆ نەخۆشـی، هەربـەم جـۆرە بـە چـاوی دڵ دەبینـرێ کـە دڵ - واتـە ڕۆح - بەختـەوەری و کۆڵـەوارییەکی هەیـە و پەرسـتن و ناسـینی خـواش دەرمـانی گەیـشتن بـەو بەختەوەرییەیە و نەزانی و گونـاحیش کۆسـپی ڕێگـای ئـەو بەختەوەرییـەن؛ ئەمـەش زانـستێکی زۆر هێژایە.

زۆربەی زانایان لەمە بێ ئاگان؛ تەنانەت بێجگە بەهەشت و دۆژەهی لەش، دان بە هیچی‌تـردا نـانێن و تەنیا ڕێگایش بە تەقلید و گوێڕایەڵی دەزانن. لە بـاس و دوان لەسـەر ئـەم بابەتـە، بـە عـارەبی زۆرم نووسیوە، بۆیە لێرەدا تەنیا ئەمە دەڵێم بۆ ئەو کەسانەی کە دەروونیان پاک و بێ‌خەوشـە و بۆخۆشـیان وشیار و تێگەیشتوون و ڕێگا دەردەکەن و بڕوایان بە دوارۆژ پتەوە، چونکە زۆربـەی خەڵـکی بڕوایـەکی وایان بە دوارۆژ نییە.

### بەشی دووهەم: ڕاستەقینەی مردن

ئەگەر بەڕاستی تێگەیشتنی ئەم پرسیارەت پێ خۆشە کە: «واتای مردن چییـە؟» بزانـە کـە مـرۆڤ دوو ڕۆحی هەیە: یەکێک لە ماکی ئاژەڵان و پێی دەڵێین «ڕۆحی ئاژەڵی» و یەکێک لە ماکی ڕۆحـی فریشتەکان کە پێی دەڵێین «ڕۆحـی مرۆڤـی». سـەرچاوەی ئـەم ڕۆحـە ئاژەڵـیە، دڵـە؛ ئـەو پارچـە گۆشتەی‌لە لای چەپی سنگدایە. وەکوو هەڵمێکی نەرم و ناسـکە لـە دەروونـدا. لـە دڵـەوە بـە هـۆی دەمارەکانەوە بە جووڵـە و لێـدانی ڕەگـەوە دەبـزوێ و دەگاتـە مێـشک و ئەنـدامانی‌تـر. ئـەم ڕۆحـە کۆڵبەری هەستەکان و جووڵانەوەیە. کە دەگاتە مێشک لە گەرمای کەم دەبێتەوە. چـاو لـە سـۆنگەی ئەوەوە هێزی بینایی هەیە و گوێ بە هۆی ئەوەوە دەبیسێ و هەستەکانی‌تریش هەر بەم چەشنە.

ڕۆح، وەکوو ئەوەیە چرایەک لە نێو ژوورێکی خڕدا هەڵکەی. چرا دەگاتە هـەر دیوارێـک، ئـەو بەشـە ڕوونـاک دەبێتـەوە. کەواتـە چـرای ڕۆحـیش بـە ئیـزنی پـەروەردگار هێـزی بینـایی و بیـستن و

---

١- حەدیس: بۆ پەرستندە چاکەکارەکانی خۆمان شتگەلێکمان دابین کردووە کە نە چاو دیویە و نە گـوێ بیـستوویە و نـە بـە دڵـی مرۆڤێکیشدا هاتووە.

٢- مەزد: کلاو ڕۆژنە.

هەستەکانی‌تر ڕوون دەکاتەوە و دەیانبزوێنێ. بۆیە کاتێک تەگەرەیەک دەکەوێتە نێو یەکێک لە دەرمارەکان، ئەو بەشە لە جووڵە دەکەوێ و گیانی تێدا نامێنێ و پزیشک هان دەدا ئەو کۆسپە بسڕێتەوە و گیان خاتەوە نێو ئەو بەشە.

ڕۆح وەکی ئاوری چرایە و دڵ وەکوو پلیتەیە و خۆراکیش چەشنی نەوت؛ کە ئەگەر بەری نەوت بگیرێ چرا دادەمرێ و کاتێکیش خواردن لە لەش بگیرێتەوە، لەش سارد دەبێتەوە و ڕۆح (ڕۆحی ئاژەڵی) دەفەوتێ و گیاندار دەمرێ. هەروەها هەرچەن نەوت هەبێ بەڵام پلیتە نەوتی زۆر بکێشێ، چرا دەکوژێتەوە و ئیدی نەوت ناکێشێ. هەروەها دڵیش بە درێژایی تەمەن وای لێ‌دێ کە ئیدی خواردن ناپەزێرێ.

دیسان هەروەکوو چۆن شتێک بدەی بە سەر چرادا دەکوژێتەوە، با نەوت و پلیتەشی بێ، کاتێ ئاژەڵیش بە توندی بریندار کەی، دەمرێ.

مەزاجی ئەم ڕۆحە تا کاتێک ئاسایی بێ، واتاگەلی ناسک وەکوو هەستەکان و بزووتن دەسەلمێنێ. کاتێ ئەم مەزاجەی پووچەڵ کرایەوە - بە هۆی گەرما یان سەرما یا هەر هۆیەکی‌تر - ئەو ئاسەوارانە ناسەلمێنێ؛ وەکوو ئاوێنەیەک تا کاتێک پاک و ساف و ساکار بێ، ڕوومەتەکان بە پاراوی دەنوێنێ، بەڵام کە تێکچوو، زەنگار و گەرد دایپۆشی، ئیتر هیچ ڕوومەتێک نانوێنێ، جا نە بەم بۆنەوە کە ڕوومەتەکان نەماون، بەڵکوو بە پێچەوانە، ئەم بۆی نییە ئەوان بنوێنێ.

واتای مەرگی ڕۆحی ئاژەڵی ئەمەیە و ئەوەی هۆکاری ئەم تێکچوونانە دابین دەکا تا لەش لە هاوسەنگی بکەوێ، یەکێک لە ئافرێندراوانی خودایە بە ناوی «پێمێرد»[1]؛ خەڵکی بە تەنیا ناوی دەزانن و ناسینی لێرەدا ناگونجێ.

ئەمەی بێژرا چۆنییەتی مەرگی هەموو ئاژەڵان بوو، بەڵام مردنی مرۆڤ بە چەشنێکی‌ترە. چونکە مرۆڤ بێجگە لەم ڕۆحەی کە هەموو گیانداران هەیانە، ڕۆحێکی‌تریشی هەیە کە پێی دەڵێین ڕۆحی ئینسانی و لە بەشەکانی تردا «دڵیش»مان پێی دەگوت. ئەم ڕۆحە لە چەشنی ئەو ڕۆحە ئاژەڵییە نییە؛ چونکە دابەش نابێ و مەکۆی ناسینی پەروەردگارە؛ هەروەک چۆن پەروەردگاری مەزن دابەش نابێ. چۆن شوێنی ناسینی یەکێک، یەکێکە دابەش نەبێ، کەواتە هیچ شوێنێکی دابەش‌پەزێر بۆی نییە ببێتە پێتەختی ناسینی وی.

پلیتە و ئاوری چرا و ڕووناکی چرا، هەر سێیت لە پێش چاو بێ: پلیتە دڵە و ئاوری چرا ڕۆحی ئاژەڵی و ڕووناکی چرا ڕۆحی ئینسانییە. هەروەکوو چۆن ڕووناکی چرا نەرمە و نەرمتر لە چرایە و دەڵێی ناتوانی ئەنگوستی بۆ ڕاکێشی، ڕۆحی ئینسانیش نەرمتر لە ڕۆحی ئاژەڵییە، بەچەشنێک کە

---

[1] - پێمێرد- ملک الموت.

ناکرێ ئاماژەی بۆ کەی.

ئەم نموونەیە کە هێنامانەوە، ئەگەر لە باری نەرمیوە سەیری بکرێ ڕاستە، بەلام لە باری‌ترەوە ڕاست نییە؛ چونکە ڕووناکی چرا پاشکۆی چرایە و بوونی بە هۆی چرایە : بە تێکچوونی وی ئەمیش دەکوژێتەوە، کەچی ڕۆحی ئینسانی پێڕەوی ڕۆحی ئاژەڵی نییە و تەنانەت چاوکەی وییە و بەفەوتانی ئەو، ئەم هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە. ئەگەر وێنەیەکی باشترت دەوێ، ڕووناکییەک بێرانە پێش چاوت کە لە چراکەی نەرمتر بێ و بوونی چرا بەندیواری بوونی وی بێ.

کەواتە ئەم ڕۆحی ئاژەڵیە لە بارێکەوە وەکوو چارەوێیە بۆ گیانی ئینسانی و لەلایەکی‌ترەوە وەکوو ئامرازێکە بۆی. کاتێک ئەم گیانی ئاژەڵییە حالی تێک‌چوو، جەستە دەمرێ و گیانی ئینسانی دەمێنێتەوە، بەلام بەبێ چارەوێ. مردنی چارەوێ و فەوتانی ئامراز، سوار نافەوتێنێ هەرچەن بێ‌ئامراز دەکەوێ.

ئەم ئامرازەی بۆیە پێی‌درا تا بتوانێ خۆشەویستی پەروەردگاری پێ ڕاو بکا:ئەگەر بە دۆزی خۆی گەیشتبێ، ئەم بارە قورسەی لە کۆڵ دەبێتەوە. ئەمەی کە پێغەمبەری خوداش فەرمووی «مردن دیارییە بۆ بڕوادار»، مەبەست ئەمەیە کەسێک بۆ ڕاو کردن، داوێک لە کۆڵ دەگرێ و لە دووی خۆی ڕایدەکێشێ؛ جا کاتێک نێچری خوی ڕاو دەکا، نەمانی داو بۆی غەنیمەتە. بەلام ئەگەر - پەنابەخوا - بەرلەوەی ڕاوی نێچیری بکا، کەرەستەکەی بفەوتێ، هەناسە سارد و کۆڵەوار و چارەڕەش دەمێنێتەوە و ئەم ئێش و ژانە دەسپێکێکە بۆ عەزابی قەبر.

**بەشی سێهەم: تۆیی تۆ بەم لەشە نییە**

گیانی خۆم! ئەمە بزانە ئەگەر کەسێک دەست و پای لە کار بکەوێ یا خۆ بەتەواوی نەمێنێ، ئەو کەسە هەر خۆیە؛ چونکە ڕاستەقینەی وی دەست و پای نییە؛ بەڵکوو دەست و پێ کەرەستە و ئامرازی ئەو کەسەن. دیارە ڕاستەقینەی تۆش نە دەست و پێ و نە سەر و سک و نە ئەم لەشەی تۆیە و ئەگەر هەموو ئەمانەشت نەبێ، دیسان «تۆیی تۆ» هەر هەیە. مردن یانێ فەلەج بوونی ئەندامانت، فەلەج بوون یانێ لە ژێر ئاوزەنگی تۆ دەرهاتن. چونکە کاتێک بە ڕای تۆی دەکرد بە هوی شتێکەوە بوو کە پێیان دەگوت «هێز». ئەم دانستەش ڕووناکیەک بوو کە لە سۆنگەی چرای ڕۆحی ئاژەڵیتەوە پێی ڕادەگەیشت. چونکە لە ڕەگی تۆدا کۆسپێک هاتەدی، ئەندامانت لە نووری چرای ڕۆحی ئاژەڵیت بێ‌بەش کەوتن و هێزیان لێ وەرگیراو بێ‌گیان کەوتن و ئەوەش پێی دەڵێن مەرگ. دیارە توش هەروەکوو خۆت ماویتەوە هەرچەند خزمەتکارانت نەماون.

ڕاستەقینەی تۆ کوو دەتوانێ ئەم لەشەت بێ؟ ئەگەر لە خۆتدا ڕابمێنی تێدەگەی ئەم ئەندامانەت

هەر ئەو ئەندامانەی سەردەمی منداڵیتە نین، کـە ئەوانـە هـەموو گۆڕانیـان بەسـەردا هـاتووە. کەواتـە پێستت هەر ئەوە نییە، کەچی تۆ هەرخۆتی؛ بۆیە پێت دەڵێم ڕاستەقینەی تۆ ئەم لەشـە نییـە. ئەگـەر لەش تێکچوو، بڵێ چش! تۆ هەروا لە خۆتدا زیندووی.

تایبەتمەندییەکانی تۆ دوانن: یەکێک بە بەشداری لـەشـت، وەکـوو برسـێتی، تینـوێتی و خـەون؛ ئەمەش بە هۆی لەشەوە جێبەجێ دەبێ و بە مردن پووچەڵ دەبێتەوە. دووەم ئەوەی کە لەشـی تێـدا بەشـدار نییـە؛ وەکـوو ناسـینی پـەروەردگار و شـاد و شـوکر بوونـەوە بـە جەماڵـی جـەمیلی؛ ئـەم تایبەتمەندییـە لـە زاتی تۆدایـە و دەگەڵـت دەمێنـێ. واتـای باقیاتوساڵـحات هـەر ئەمەیـە. ئەگـەر پێچەوانەی ئەمەش بێ، واتە نەناسینی پەروەردگار، ئەوەش هەر تایبەتمەنـدی زاتی تۆیـە و دەگەڵـت دەمێنـێ. ئەمـەش کـوێرایی ڕۆح و تـووی چارەڕەشـیتە. وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعۡمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلٗا [1].

## بەشی چوارەم: ڕاگرتنی هاوسەنگی ڕۆح

ئەم ڕۆحی ئاژەڵییە کە لەم جیهانەیە، پێکهاتووە لە چوار خڵت کە بریتین لـە: خـوێن و بەڵـغەم و سەفرا و سەودا. بنەمای ئەم چوارەش ئاوە و ئاور و خاک و هەوا. هاوسەنگی و ناکۆکی مـەزاجی مـرۆڤ لـە جیـاوازی ڕادەی گـەرمی، سـاردی، شـێ و وشـکییەیە. مەبەسـتی زانـستی پزشـکیش ڕاگـرتنی هاوسەنگی نێوان ئەم چوارەیە تا بـەم چەشـنە ئـەم لەشـە وەکـوو ئەسـپێکی خوەشـبەز ئـەم ڕۆحـی ئینسانییە هەڵگرێ و خزمـەتی کـا. ئـەم ڕۆحـە ئینـسانییەش هـی ئـەم عالەمـە نییـە و لـە عالـەمی سەرووەوە هاتۆتە خوار و لە ماک و گەوهەری فریشتەکانە. داهاتنی بۆ ئەم دونیایە، دەگـەڵ سروشـتی ناسازە و لێرە غەریب کەوتووە. بەڵام ئەم نـامۆ کەوتنـە بـۆ ئەوەیـە تـا لـە ڕوونـاکی، توێـشووی خـۆی هەڵگرێ، هـەروەک خـودا فـەرمووی: قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ [2]. ئەمـەش کـە پـەروەردگار فـەرمووی: إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ، فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي [3]، ئاماژەیە بە جیاوازی نێوان ئەم دوو ڕۆحە، کە یەکیان قەور بۆتـە ماڵـی و ئەویتریانی لە ڕۆحی خۆی خولقاند. هەروەکوو چۆن ئەو ڕۆحـە ئاژەڵـی و سـووکە، هاوسـەنگییەکی

---

١- قورئان (٧٢/١٧) هەرکێش لەم دنیایە کوێرە، لە دواڕۆژیشدا کوێرەیە و پتریش ڕێگەی لێ گوم دەبێ. (هـ)

٢- قورئان (٣٨/٢) گوتمان: گشتوو لە بەهەشت بڕۆنەخوارێ؛ ئەوسا ئەگەر لای منەوە ڕێنوێنێکتان بۆ هات، ئەوانەی بکەونـە شـوێنی ڕێنوێنییەم، نە لە هیچ شتێ دەترسن نەخەم دەخۆن. (هـ)

٣- قورئان (٣٨/٧١و٧٢) وا خەریکم مرۆیەک لە قوڕ چێ بکەم؛ هەرگا لەشیم تەواو کرد و لەگیانی خۆم فووم پێدا کرد. (هـ)

هەیە و پزیشک هۆکاری ئەو هاوسەنگییە دەناسێ و لە ناخۆشی دەیپارێزێ، ڕۆحی ئینسانیش - کە ڕاستەقینەی دڵە - هاوسەنگییەکی هەیە کە بە هۆی زانستی ئاکار و چاوەدێری لە خۆ کردن ڕادەگیرێ؛ ئەمەش بە پێی پێوەری شەریعەتەوە دەناسرێ و ئاکار دەبێتە هۆی سەلامەتی ڕۆح. باس لەسەر ئەم چەمکە لە «بنەماکانی موسوڵمانیدا» دێت.

خویان[1] بوو تا کەسێک ڕاستەقینەی ڕۆحەکانی نەناسێ، ناتوانێ لە دوارۆژیش بگات؛ هەروەکوو چۆن ناتوانی خودا بناسی مەگین ئەوەی خۆت بناسی. کەواتە خۆناسین، کلیلی ناسینی پەروەردگار و ناسینی دوارۆژە. بنەمای ئایین بڕوا بە خوا و ڕۆژی پەسڵانە؛ بەم هۆوە لەسەر ئەم بابەتە زۆرتر ڕۆیشتین.

بەڵام ئەم نهێنییانە بارێکی‌تریشان هەیە کە ئێمە باسمان لێ نەکرد، چونکە هەم ئیزن بە وتنی نەدراوە، هەمیش ئاوەزی مرۆڤ فامی ناکات و هەموو ناسینی خودا و ڕۆژی پەسڵانیش لەسەر ئەوە ڕاوەستاوە. هان بدە تا لە خۆتدا بە چاوەدێری و موجاهیدە لێی بگەی و بیناسی؛ چونکە ئەگەر لە کەسێکی‌تری ببیسی، بڕوای پێ ناکەی؛ زۆر کەسان بیستوویانە و نەیانسەلماندووە بڕوایان پێ نەهێناوە. ئەم دانستەی پەروەردگارە بە ڕاشکاوی نە لە قورئاندا هاتووە و نە لە حەدیسدا، بۆئەوەی ئەگەر خەڵک بیبیسن، نایسەلمێنن. خودا فەرمووی بە پێغەمبەران: كَلِّمُوا النَّاسَ عَلَى قَدَرِ عُقُولِهِم. دەگەڵ خەڵکیدا بە ڕادەی فامیان بپەیڤن. وەحی کراوە بەسەر هەندێ لە پێغەمبەراندا کە: «لە دانستەکانی ئێمە شتێک کە خەڵکی لێی تێنەگەن مەیڵێن، چونکە نایپەزێرن و تووشی زیان دەبن».

## بەشی پێنجەم: واتای حەشر و نەشر و گەڕاندنەوە

لەمە کە بێژرا تێگەیشتی کە ڕاستەقینەی مرۆڤ قائیم بە زاتە نەک لەش. واتای مردن نەبوونی و نەمانی مرۆڤ نییە؛ بەڵکوو دابڕانی وییە لە لەش. واتای حەشر و نەشر و گەڕانەوە، ئەوە نییە کە پاش نەمان، جارێکی‌تر مرۆڤ بخولقێنرێتەوە؛ بەڵکوو ئەوەیە جەستە و لەشێکی دەدەنێ هەر بەو چەشنەی کە پێشتر بوویە و دیارە لە ڕوانگەی (ئێمەی مرۆڤەوە) ئەمە زۆر ساناترە لەوەی کە هەوەڵجار هەم ڕۆحی ئینسانی دەخولقا و هەم جەستە. ڕۆحی ئینسانی کە لە سەرەتاوە ئافرێندراوە و هەر وەک خۆیەتی. جەستەش کە پێشتر بووە و ئەمجار بە تەنیا ئەندامەکانی کۆ دەکرێنەوە و لەسەر شێوەی پێشوو (دونیا) دەخولقێتەوە؛ دیارە ئەمە لە ڕوانگەی ئاوەزی ئینسانی ئێمەدا وایە و مرۆڤیش قەد ناتوانێ ڕێ بباتە سەر بیری خودا، چونکە لەو شوێنەی ڕا کە دژواری نەبێ، ساناییش بێ‌واتایە.

---

[1]. خویان: ئاشکرا.

بۆ گێڕاندنەوەی لەش بۆ ڕۆح، مەرج نییە هەمان لەش بدرێتەوە بە هەمان ڕۆح، چونکە دیارە لە کاتی لەدایکبوونەوە تا مردن، لەش بە خواردنی هەر خۆراکێک تایبەتمەندی ئەو خۆراکەی بەسەردا کاریگەر دەبێ و بەم بۆنەوە بێژمار تووشی گۆڕان دێ.

ئەوانەی دانیان بەم مەرجەدا دەنا، تووشی کێشەی زۆر هاتن و بۆیە وەلامی لاوازیان بۆ ئەم پرسیارانە هەبوو: کاتێ پرسیاریان لێیان دەکرد کە گەر کەسێک کەسێکیتر بخوا، ئەندامانی ئەو دەبێتە هی ئەم، جا لە دوارۆژدا بەشی کێ دەدرێتە کێ؟ یا خۆ ئەگەر ئەندامێکی کەسێک ببڕن، پاشان ئەو کەسە چاکەیەک بکا، ئەو ئەندامەش بەشدار دەبێ یا نە؟ ئەگەر نە، دەی لە بەهەشتدا بێ دەست و پێ و چاو و گوێ کەی دەبێ؟ ئەگەر بڵێین لەگەڵی ئەو کەسە دەبێ، دەیجا ئەو کەسە لە دونیادا هیچ بەشداری ئەو چاکە نەبووە، چۆن لەو دونیا بەشداری پاداش دەبێ؟ لەم چەشنە وڕێنانە دێنە گۆڕێ و پەرسفیشی بۆ دەدۆزنەوە.

جا کەسی برای! کە تو لە ڕاستەقینەی گێڕاندنەوەی لەش گەیشتی، دەزانی کە هیچ پێویست بەم پرسیارانە ناکا. ئەم گرفتە لەوێوە تووش هات کە پێیان وابوو ڕاستەقینەی تۆ، لەشی تۆیە؛ کە لەش دەقاودەقی خۆی نەبێ، ئەوە ئەو کەسە نییە و دیارە بنەمای ئەم پەیڤەش هەڵەیە.

## بەشی شەشەم: دیتنی بەهەشت و جەهەننەم لەم دونیایەدا

ڕێباز و بۆچوونی زۆربەی مەلایان و موتەکەلیمان وایە کە گیانی مرۆڤ بە مردن دەفەوتێ و پاشان دێتەوە دی و ئەمەش بەراوەژووی[1] ڕاستەقینەیە.

کەسی خۆم! باش بزانە، هەرکەس کەوتە دووی قسەی کەسانیتر، کوێرە. کەسێک لە ئەم پەیڤە بلێ نە تەقلید دەکا و نەک بەسیریشە. ئەگەر بینا بوایە دەیزانی مردنی لەش، ڕۆح نامرێنێ و ئەگەریش تەقلیدی بکردایە دەیزانی کە لە قورئان و حەدیسدا وا هاتووە کە پاش مردن، ڕۆح هەروەک خۆی دەمێنێتەوە. ڕۆحەکان پاش مردن دەبنە دوو دەستەوە: ڕوحی بەختەوەران و ڕۆحی چارەڕەشان. بەلام **ڕۆحی بەختەوەران**، قورئان دەلێ: وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ. دەفەرمێ: پێتان وا نەبێ ئەوانەی لە ڕێگای پەروەردگاردا کوژراون، مردوون؛ ئەمانە زیندوون. بەلکوو زیندوو و بەختەوەرن بەو خەلاتانەی لە خێوی خۆیان وەرگرتووە و بەردەوام ڕۆزی خۆیانی لێ وەردەگرن.

بەلام **چارەڕەشان**؛ کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) و یارانی لە شەڕی بەدردا کافرەکانیان

---

[1] - بەراوەژوو= بە پێچەوانە.

کوشت، یەک‌بەیەک بانگی دەکردن - لە کاتێکدا کە کوژرا بـوون - و دەیگـوت:«فـلان و فـلان! ئـەو بەڵێنانەی کە خودا پێی دابووم لە بۆ دوژمنانی خۆی، بینیتان؟ ئەو بەڵێنانەی کە دابووی سەبارەت بـە سزای پاش مردن، ڕاست بوو یا نە؟» یارانی دەیـانگوت: «ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئەمانـە تـاقمێکی مردوون، بۆچ قسەیان دەگـەڵ دەکـەی؟» فـەرمووی: «بـە خودایـەک کـە گیـانی موحەممـەدی لـە دەستدایە! ئەمانە باشتر لە ئێوە ئەم قسانە دەبیسن، بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە».

هەرکەس بتۆژێتەوە لەو خـەبـەرانـەی کـە سـەبارەت بـە مـردووان و ئاگـەداری ئـەو مردووانـە لـە ئازیەت‌باران و ڕووداوی نێو ئەم دونیایە گێڕدراونەتەوە، بە دڵنیاییەوە تێ‌دەگا کە باسـێک لـە فـەوتانی پـاش مـردن نـەکراوە، بەڵـکوو بێـژراوە دانـستە و دانـشتگە دەگـۆڕێ. گـۆڕیش یـا ئەشـکەوتێکە لـە ئەشکەوتەکانی دۆزەخ، یا خۆ دارستانێکە لە دارستانەکانی بەهەشت.

کەواتە باش بزانە بە مردن هیچ دانـستەیەک لـە دانـستە زاتییـەکانی تـۆ پووچـەڵ نابێتـەوە، بـەڵام هەست و داڵغە و بزووتنەکانت ـکە بە هۆی مێشک و ئەندامانتەوەن،پووچـەڵ دەبنـەوە و تـۆ بـە تـەنیا دەمێنی بە هەمان چەشنێک کە لێـرەوە ڕۆیـشتی. ئـەوەش بزانـە کاتێـک ئەسـپێک بمـرێ، ئەگـەر سوارەکەی جۆلا بێ نابێتە مەلا و ئەگەر کوێر بێ، بینا نابێ و ئەگەر بینـا بـێ، کـوێر نابـێ؛ بەڵـکوو بـە تەنیا پیادە دەبێ و بەس. لەش چارەوێیە وەکوو ئەسپ، سواریش تۆی.

بۆیە ئەوانەی بیر و هۆشیان لە هەسـتەکانیان وەردەگێڕنـەوە و بایـەخ نادەنـە حـەز و داخوازەکـانی هەوا و هەوەسیان و بـە خـۆدا ڕۆ دەچـن و یـادی پـەروەردگاریان بـە بـەردەوامی دەکـەن و ڕێگـای تەسەوف دەگرنە پێش و دەتوانن بارودۆخی ڕۆژی پەسڵان بە موشـاهیدە ببیـنن و لێـی بـەئاگـا بـن، چونکە هەرچەن ڕۆحی ئاژەڵیان تێک‌نەچووبێ بـەڵام نـەختێ تووشـی سـستی بـێ و خـەو بیباتـەوە، ناتوانێ ببێتە کۆسپ لە هەمبەر دیتنی ڕاستەقینەی دوارۆژ. کەواتـە ئـەوەی خەڵـکی بـە مـردن پێـی دەگەن، ئەمان لە ژیندا تێی‌دەگەن. ڕەنگە پاش ئەوەی بەخەبەر بێتـەوە و بێتـەوە نێـو دونیـا هیچـی لەوەی پیشانی دراوە، لە بیریدا نەمابێ، بەڵام ئەگەر بەهەشتی پێ نوێنـدرا بـێ، هەسـت بـە شـادی و بەختەوەری و ئاسوودەگی دەکا و ئەگەر بە ئاوەژووی ئەمە بێ، واتە دۆزەخی پێ نوێنـدرا بـێ، هەسـت بە ماندوویی و جەمامی دەکا. ئەگەر لە مێشکیدا بیرەوەرییـەک لـەو سـەفەرە مابێتـەوە، دەیـڵێتەوە. ئەگەر لە خەزانەی خەیاڵیدا ئەو شتەیان «موحاکات[1]» کردبێ، بە وێنەیەک پیشانی دەدرێ کە باشـتر لە بیری بمێنێ و بیلێتەوە. هەروەکوو پێغەمبەری خودا (درووودی خوای لێ بێ) پاش لە نوێژ بوونـەوە فەرمووی: «هۆشە ترێیەکان لە بەهەشتڕا پێم نواند، ویستم بیهێنمەوە نێو ئەم دونیایە».

---

١- واتە بە شێوەی شتێک پیشانی درابێ (Representation- imitation)

باش بزانە ئەو ڕاستییە کە لە بیچمی ئەو ترێیەدا نوێندرابوو، قەد ناهێنرێتە نێو ئەم دونیاوە کە گەر بهاتایە، پێغەمبەر دەیهێنا، بەڵام بە موشاهیدە پێی نوێندرا بوو. ڕاستەقینەی تێگەیاندنی ئەم بابەتە درێژە و پێویست ناکا زۆری لێ بگەی.

مەبەست لەم پەیڤە ئەوە بوو کە تێبگەی پێغەمبەر بە هۆی تەقلید و بیستن و جوبرەئیلەوە شارەزای بەهەشت نەبووە؛ بەڵکوو بەڕاستی بەهەشتی بینیوە. ئەوەش دەزانین کە ڕاستەقینەی بەهەشت لەم دونیاوە نابینرێ، بەڵکوو پێغەمبەر بۆ ئەو دونیا سەفەری کرد و بە چاوی خۆی ئەویی بینی؛ ئەمەش جۆرێک لە میعراج بوو. بەڵام لە دونیا دەرچوون دوو ڕەهەندی هەیە: یەکێک بە مردنی ڕۆحی ئاژەڵی، دووهەم بەبێ هەستکردنی ڕۆحی حەیوانی.

لەم جیهانەڕا بەهەشت نابینرێ، هەروەکوو چۆن حەوت ئاسمان و حەوتپێستی زەوی لە پێستی پستەیەکدا ناگونجێ، زەڕڕەیەکی بەهەشت لەم جیهانە ناگونجێ. هەروەکوو چۆن ئەو بەشەلە زەوی و ئاسمان کە چاو دەیبینێ، گوێ لە دیتنی بێبەشە، هەموو هەستەکانی ئەم جیهانەش لە چێژەکانی بەهەشت بێبەشن.

## بەشی حەوتەم: مانای عەزابی قەبر

ئێستا کاتی ئەوەیە لە واتای عەزاوی قەبر بگەی. عەزابی قەور دوو جۆرە: ڕۆحانی و جەستەیی. عەزابی جەستەیی هەمووکەس دەیزانن، بەڵام کەسێک عەزابی ڕۆحانی دەناسێ کە خۆی ناسیبێ و لە ڕاستەقینەی ڕۆح گەیشتبێ و بزانە ڕۆح قایم بە زاتی خۆیە و بۆ بوونی پێویستی بە لەش نییە و پاش مردنیش هەر هەیە و قەد نامرێ؛ هەرچەند دەست و پێ و گوێ و چاو و هەموو هەستەکانی بە مردن لێی وەردەگیرێتەوە. دیارە بە نەمانی هەستەکانی هەموو شتی ئەم دونیایە وەکی ماڵ و منداڵ و ژن و کەسوکار و ئەوەی لە ئەرز و ئاسمانایە، لێی وەردەگیرێتەوە. جا دیارە ئەگەر لە دونیا خێی دابێتە ئەم شتانە و هۆگری دەست و پێوەندەکانی دونیا بووبێ، هەمووی لێ وەردەگیرێ و ئاوری دووری لەمانەی دەکەوێتە گیان، بەڵام ئەگەر خولیای دونیا نەبووبێ و ئاواتی مردن بێ، بە مردن ئاسوودە دەبێ؛ یان ئەگەر ئەویندار خودا بووبێ و لە دونیادا هەستی بە دووری لە خۆشەویستی کردبێ، پاش مردن ئاواتی دێتە دی و بە دیتنی خۆشەویستی خۆی شاد و شوکر دەبێ و دەحەسێتەوە و ئۆقرە دەگرێ.

جا تێفکرە بزانە چۆن دەبێ حاڵی ئەو کەسەی کە لە ڕاستەقینەی خۆی بگات و بزانێ ئەم هەتاهەتایە دەژی و هەموو خۆشەویستە دونیاییەکانی دەفەوتن و کاتێ ئەم لە دونیا ڕۆیشت چەندە تووشی ڕەنج و ئازار دێت و لە داخی دووری خۆشەویستانیدا چی بەسەر دێت، هەروەکی پێغەمبەری

خودا فەرمووی: «أحْبِبْ ما أحْبَبْتَ فإنّک مُفارقة»[1] یان ئەو کەسەی کە بزانێ تەنیا خۆشەویستی، پەروەدگارە و دونیا و هەرچی تێیدایە دوژمنی وین و خۆیانی لێ ببوێرێ مەگین بە قەدەر توێشووی ڕێگای، ئایا بە گومان دەبێ لەوەی کە چۆن ئەم جیهانە بەجێ بێڵێ و بگاتە ئاسوودەیی؟

بۆیە هەرکەس بە تەکووزی لەمەی بێژرا گەیشت، هیچ دڕدۆنگ نابێ لەوەی کە عەزاوی گۆڕ هەیە و دەبێتە بەشی ئەوانەی هۆگری دونیا بوون و پارێزکاران لێی دەپارێزرێن. بە پێی ئەم ڕاڤەیە، باشتر لەم هەواڵە دەگەی کە: اَلدّنیا سجْنُ المُؤمنِ وَ جَنَّة الکافر[2]

## بەشی هەشتەم: ڕاستەقینە و ڕادەکانی عەزاوی قەبر

جا کە لە بناوانی عەزاوی گۆڕ گەیشتی و زانیت کە هۆی وی خۆش‌ویستنی دونیایە، بزانە ئەم عەزاوە جۆراوجۆرە، بە گوێرەی کەم و زۆر بوونی گیرۆدەی دونیا بوونیان، کەم و زۆری هەیە. کەواتە عەزاوی ئەو کەسەی کە لە دونیا بە تەنیا دڵی لە گرۆی یەک شتدا بووە، کەمتر لەو کەسەیە کە هەزارانی وەکوو ماڵ و منداڵ و ژن و سامان و دەست و پێوەند دڵیان لێ ئەستاندووە. ئەگەر لە دونیا بە کەسێک بڵێن کە ئەسپێکیان دزیوی کەمتر لەو کەسەی کە پێی بڵێن دەئەسپیان ڕفاندووی تووشی خەم و کەسەر دەبێ و هەروەها ئەگەر هەموو سامانی لێ بستێنن زۆرتر لەوەی کە نیوەی سامانی ببەن تووشی خەم دەبێ و کەمتر لەوەی کە دەگەڵ سامان، ژن و منداڵیشی ببەن خەمبار دەبێ.

کەواتە عەزاب و ئاسوودەیی هەرکەس بە گوێرەی بەندیوار بوونی بە دونیاوەیە. ئەو کەسەی بە تەواوی خۆی بە دونیا دۆڕاندبێ و دڵی لە مستی نابێ، هەروەکی خودا فەرمووی: ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ[3]، عەزابی زۆرتر دەبێ. پێغەمبەری خودا فەرمووی: «دەزانن هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە چی بوو فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ[4]؟». وتیان: «خودا و پێغەمبەری باشتر دەزانن». فەرمووی: «عەزاوی کافر لە گۆڕدا دەبێ کە نەوەد و نۆ ئەژدیهای لێ ڕاستەو دەبن». دەزانی ئەژدیها چییە؟ نەوەدونۆ ماری نۆ سەرن. ئەو کافرە دەگەزن و دەڵێن تا ئەو دەمەی ڕۆژی حەشر بێ ئەم سزایە بەردەوامە.

---

١- هەر چیت خۆش دەوێ، خوشت بوێ، بەلام بە ئاگا بە مالاواییان لێ دەکەی.

٢- دونیا زیندانی برواداڕ و بەهەشتی کافرانە.

٣- قورئان (١٦/١٠٧) چون ئەمانە گوزەرانی سەردنیایان لە دواڕۆژ پتو خۆش دەوێ. (هـ)

٤- قورئان (٢٠/١٢٤) ژینی لە تەنگانە وایە و ڕۆژی سەلاش کورە لە گۆڕی دەردەخەین. (هـ)

تێگەیشتووان ئەو مارانە بە چاوی بەسیرەت دەبینن، کەچی نەزانان دەڵێن: «ئێمە سەیری نێو گۆڕێکمان کردووە و هیچمان نەدیوە؛ ئەگەر شتی وابوایە چاوی ئێمە درۆی لەگەڵ نەدەکردین».

ئەم نەزانانە دەبێ بزانن کە ئەو مارانە، لە زاتی ڕۆحی مردوودان و لە ناوئاخنی گیانی وی بەری نین تا کەسانیتر بیانبینن. بەڵکوو ئەم ئەژدیهایە پێش لە مردن لە گیانی وی ڕۆچووە و ئەو ئاگای لێ نەبووە. هەروەها دەبێ بزانی ئەم ئەژدیهایە بریتییە لە دانستەکانی نەفسی وی و ژمارەی سەرەکانی بە قەدەر ژمارەی ئاکارە نزمەکانی وین و بنەمای ئەم ئەژدیهایە لەسەر خۆشەویستی دونیایە، پاشان سەرەکانی لە سۆنگەی ئاکاری نزم و خۆشەویستی دونیا و حەرس و گزی و مەرایی و زمانلووسی و خۆبەزلزانی و فیز و دەعیە و دەمار و دوژمنیەوە بەدیدێن. بناغەی ئەم ئەژدیهایە و سەرەکانی بە چاوی بەسیرەت دێنە دیتن؛ بەلام ژمارەیان بە تیشکی پێغەمبەرایەتییەوە دەبینرێ.

کەواتە ئەم ئەژدیهایە لە نێو گیانی کافراندا پەپکەی خواردووە و بەرپیوارە، نە بە هۆی نەزانیوە، بەڵکوو بە بۆنەی ئەوەوە کە هەموو شتی خۆیان لە ئەوینی دونیادا دۆڕاندووە. هەروەکوو خودا فەرمووی: «ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْـَٔاخِرَةِ»[1] هەروەها فەرمووی: «أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا»[2]. دیارە ئەگەر ئەم ئەژدیهایە لە دەرەوەی ناخی وی بوایە، باشتر بوو، چونکوو ڕەنگ بوو جاربەجار پشوویەکی بدایا و وازی لێ بێنایا، بەلام چونکوو لە ناخیدا جێگرتووە - کە ئەمە لە تایبەتمەندییەکانی وییە - کەی لە دەستی ئارام دەگرێ؟

هەروەکوو چۆن کەسێک کارەکەرێکی بێ و بیفروشێ و پاشان بەخەبەر بێتەوە کە هۆگری بووە، ئەو ئەژدیهایە کە لە ناخیدایە و دەیگەزێ، ئەو ئەوینەیە کە لە دڵیدا بوو و چوون بەرپیوار بوو، نەیدەتوانی بیبینێ و پێی نەدەزانی، تا ئێستاکە زامەکەی سەری کردۆتەوە. دیارە ئەم نەوەد و نۆ ئەژدیهایە، بەر لە مردنیش هەر دەگەڵی بوون و ئەم ئاگای لێیان نەبووە تا ئێستا کە زامەکەی هاتۆتە سۆ. هەروەکوو چۆن لەگەڵ خۆشەویستدا بوون دەبێتە هۆی ئۆقرە و ئارامی دڵ، دابڕان لە خۆشەویستیش دەبێتە هوی بێقەراری و نائارامی: ئەوینی پلە و پاگە، وەکوو ئەژدیهایەک بە دڵیەوە دەدا، ئەوینی ماڵوسامان وەکی مار و ئەوینی خانی وەکی دووپشک و ئەوانیتریش بەم چەشنە پێوەی دەدەن.

هەروەکوو چۆن ئەوینداری کچی کارەکەر لە دەردی دووریدا بۆ ئەهوەن کردنەوەی خۆی، خۆی لە ئاو و ئاور دەهاوێژێ یا خۆ پێی خۆشە دووپشکێک پێوەی بدا، ئەوەی تووشی عەزاوی گۆڕیش، پێی خۆشە خۆی تووشی ئازارێکیتر بکات تا لەو ئازارە دەرباز بێ؛ لەم جیهانەدا خەڵکی دەزانن

---

١- قورئان (١٠٧/١٦) چۆن ئەمانە گوزەرانی سەر دنیایان لە دواڕۆژ پتر خۆش دەوێ. (هـ)

٢- قورئان (٢٠/٤٦) پێیان دەڵێن: خۆشی دنیا و دەرباز کرد و بە باشی بەهرەتان لێ برد. (هـ)

دووپشک و مار لە دەرەوە چزوو دەدەن و دیارە، کەچی لە گۆڕدا لە گیانـەوە پێـوەی دەدەن و کـەس نایبینێ.

کەواتە، بەڕاستی هەرکەسە هۆی عەزاوی گۆڕ، خۆی لەگەڵ خۆی دەیبا و لە گیانیـدا هەڵـیدەگرێ. بۆیە پێغەمبەر (دخ) فەرمووی: «أنّما هيَ اعمالُكم تُردُّ اليْكم». بۆیە خـوداش فـەرمووی: :«كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ [1]» هـــــــــــــەروەها: «وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَـٰفِرِينَ [2]». (دۆژەەدەورەی داوە لە کافران)؛ نەیگوتووە دەورە دەدا.»

## بەشی نۆهەم: ئەوەی لەو جیهانی‌تر بێ، بە چاوی ئەم دونیایە نایەتە دیتن

ڕەنگە بڵێی: لە ڕواڵەتی شەرعدا وا دەردەکەوێ کە ئەو ئەژدیهایە بە چاوی سـەر دەبینـرێ، کـەچی ئەو ئەژدیهایە کە لە نێو گیانایە، نادیارە.

بزانە، ئەم ئەژدیهایە دەبینرێ، بەڵام بۆ مردووان و ئەوانەی لەم دونیایەدان، نـایبینن، چونکـە ئـەوەی لەو جیهانەدا بێ بە چاوی ئەم دونیایە نابینرێ. مردوو، ئەو ئەژدیهایە وا دەبینێ کە تـۆ لـەم دونیایـەدا ئەژدیها دەبینی، بەڵام تۆ نایبینی. هەروەکوو چۆن خەوتوویەک دەبینێ مار پێوەی دەدا و ئـەوەی لـە تەنیشتی دانشتووە نایزانێ. دیارە ئەو مارە لە چاو خەوتوودا هەیە و ئازاری لێ دەبینێ، کەچی لـە چـاو بێداردا شتی وا هەر نییە و ئەمەش کە هاواڵی بەخەبەر نایبینێ، هیچ لە ئازاری کەم ناکاتەوە.

کاتێ خەوتوویەک لە خەوندا دەبینێ مار پێوەی دەدا، ئەو زامە دوژمنێکە کە بەسەریدا زاڵ دەبـێ و ئەو ئازارە ڕۆحانیە بەسەر دڵیدا دێ، بەڵام وێنەی ئەوە - کاتێک بە ئەمانەت لەم دونیـاوە وەردەگـیرێ - مارێکە. جا کاتێک دوژمنێکی بەسەردا زاڵ دەبێ، دەڵـێ: «خەونەکـەم هاتـەدی» و دەڵـێ: «بریـا مارێک دەیگەستم و دوژمن نەیدەبەستم». کە ئازاری دڵی وی لە ئازاری چـزووی مـار بەسـەر لەشـدا گەلێک زۆرترە.

کەواتە ئەگەر بڵێی ئەو مارە نییە و ئەو شتەی دەیگەزێ خەیاڵێکە و هیچی‌تـر، لـە هەڵـەدای و ئـەو مارە هەیە. هەرشتێک تۆ لە خەوندا بیبینی، بۆ تۆ هەیە، هەر چەنـد بێجگـە لـە تـۆ کـەس نـەیبینێ. هەروەها هەر شتێک تۆی نەیبینی، بۆ تۆ نەبوونە، هەرچەند هەموو عالەم سەیری کەن. جـا کـە عـەزاو و هۆی عـەزاو مـردوو یـان خـەوتوو وەکـوو یـەک تووشـی هـاتوون، دیـتن و نـەدیتنی کەسـانی‌تر چ‌کاریگەرییەکی بەسەر ئەو عەزابە هەیە؟ بێجگە لەمەی کە خـەوتوو، خێـرا بـە ئاگـا دەبێتـەوە و لێـی

---

[1] - قورئان (١٠٢/٥و٦و٧) بەڵام ئەگەر ڕاستەقینەو بزانیبا، ئاشکرا دۆژەهتان دەدی. دیسانەکەش، هەر بە ئاشکرا دەتاندی. (هـ)

[2] - قورئان (٩/٤٩) ئەوانەی خودا نەناسن دۆژەەدەوەرەیان لێدەدا. (هـ)

دەرباز دەبێ؛ کەواتە پێی دەڵێن خەیاڵ. بەڵام مردوو بەردەوام لەگەڵیایە،چونکە مردن دوایی نییە - کەواتە لێی دەرباز نابێ و وەکوو شتەکانی ئەم دونیایەیە لە مانەوەدا.

شەرع نەیگوتووە ئەو مار و دووپشک و ئەژدیهایانەی نێوگۆڕ - مادامێ کە خەڵکی لە بەندی دونیادا بن- دەتوانن ببینن. بەڵام ئەگەر کەسێک بە خەون لەم جیهانە بڕواتە دەرەوە و مردوویەک لە نێو مار و دووپشکدا ببینێ، پێغەمبەران و چاکانی خودا لە بێداریشدا لەو بارودۆخەدا دەیبینن. چونکە ئەوەی خەڵکی بە خەون پێی دەگەن، ئەوان لە بێداریدا تێیدەگەن و جیهانی مەحسووسات ناتوانێ ببێتە کۆسپێک لە پێش چاویان بۆ سەیری ئەو دونیا.

ئەم باسە درێژە، بۆ پەرسڤدانەوەی ئەو گێلۆکانە بوو کە سەیری گۆڕ دەکەن و هیچ نابینن، عەزاوی گۆڕ بە درۆ دەزانن و هۆی ئەمەش ئەوەیە کە لە کاری ئەو دونیا نەگەیشتوون.

## بەشی دەیەم: عەزاوی گۆڕ بۆ چ کەسانێک هەیە و بۆ کێ نییە؟

ڕەنگە بڵێی: «ئەگەر عەزابی قەبر لە سۆنگەی خۆشویستنی ئەم دونیاوە تووش دەبێ، دەیخۆ کەس لەم خۆشویستنە بەری نییە، چونکە هەموو کەس ژن و منداڵ و ماڵوسامانی خۆش دەوێ. کەواتە هەموو کەس عەزاوی گۆڕی هەیە و کەس لێی دەرباز نابێ».

پەرسڤی ئەم پرسە بەم جۆرەیە کە «زۆر کەسان هەن کە لە دونیا تێر دەبن و دونیا هیچ شادی و خۆشییەکیان ناداتێ و تامەزرۆی مردن دەبن؛ زۆر لە موسوڵمانان کە هەژار دەبن بەم چەشنەن، بەڵام ئەوانەی کە ساماندارن دەبنە دوو دەستە: تاقمێک هەرچەند ئەم جیهانەیان خۆش دەوێ، بەڵام خودای مەزنیشیان خۆش دەوێ، جا ئەگەر خودایان زۆرتر خۆش بوێ، تووشی عەزابی گۆڕ نابن. ئەمانە وەکی ئەو کەسەن کە خانوویەک و شارێکی هەیە کە خۆشی دەوێن، بەڵام زۆرتر حەزی لە دەسەڵات و سەرۆکی و کۆشک و تەلارە. جا، کە دەستووری پێدرا و بووبە گەورە و سەرۆکی شارێکیتر و ماڵ و شاری خۆی بەجێهێشت، دڵتەنگ و پەرێشان نابێ و دەردی دووری لە زێد، ئازاری نادا؛ چونکە زۆرتر حەزی لە گەورەیی و سەرۆکی بووە، هەرچەن لە وڵاتێکیتردا.

پێغەمبەران و چاکان و پارێزکارانی موسوڵمان، هەرچەند ژن و منداڵ و ماڵوسامانی خۆیان خۆش دەوێ، بەڵام کە خۆشەویستی خودا هاتە ئاراوە، هەموو خۆشەویستییەکیتر پووچەڵ دەبێتەوە و ئەم چێژە هی پاش مردنە و ئەم کەسانە لەم عەزابە بە دوورن. بەڵام ئەوانەی زۆرتر هۆگری دونیان، لەم عەزابە دەرباز نابن و زۆرتر ئەوانەی کە تووشی عەزاب دەبن لە هۆگرانی دونیان. بۆیە پەروەردگار فەرمووی: وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ثُمَّ ، نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ

فِيهَا جِثِيًّا[1]. ئەم تاقمە ماوەیەک ئازار دەدرێن. جا کە ماوەیەک بەسەر دووری لە دونیادا ڕابورد، هۆگری و خۆشەویستی دونیایان کەم دەبێتەوە، تا بە یەکجاری لە بیری دەکەن و هۆگری خۆشەویستی خوا دەبن.

بەڵام ئەو کەسەی کە خودای مەزنی خۆش ناوێ لەو عەزاوەدا دەمێنێ؛ چونکە یاری وی هەر بە تەنیا ئەوە بووە کە لێیان ئەستاندووە: چۆن لێی دەرباز دەبێ؟ هۆی عەزابی هەتاهەتایی کافر هەر ئەمەیە.

بزانە هەموو کەس دەڵێ کە پەروەرێنەرم لە دونیا خۆشتر دەوێ، بەڵام دەبێ بۆ ڕاست و درۆی ئەم قسەیە، خۆی تاقی بکاتەوە. ئەوەش بەم چەشنە کە نەفس و شاوەت بۆ کارێکی بانگ دەکەن و خوداش بۆ کارێکی‌تر بە پێچەوانەی ئەو کارە. ئەگەر دڵی بە باری دەستووری خودا ڕۆیشت، ئەوە هۆگری خودایە و خودای زۆرتر خۆش دەوێ؛ هەروەکوو ئەوەی دوو کەس لە لای کەسێک هێژا بن، بەڵام یەکێکیان هێژاتر. کە دژایەتی کەوتە نێوانیان، زۆرتر دەڕواتە لای ئەو کەسەوە کە خۆشەویستترە لە لای و لەم سۆنگەوە دەزانی کە کامیانی زۆرتر خۆش دەوێ. بەڵام کەوا نەبوو، پەیڤی سەرزارەکی هیچ کەڵکی نییە و ئەو پەیڤە بێجگە لە درۆ هیچ نییە.

بۆیە پێغەمبەری خودا فەرمووی: «هەر دەم لااله الا الله بێژان خۆیان دەپارێزن لە عەزابی خودای مەزن تا ئەو دەمەی دین بە دونیا بفرۆشن. کە وایان کرد پەروەرێنەر، بە درۆزن دایان دەنێ و دەڵێ: پەیڤی لا اله الا الله یان، پەیڤێکی درۆ بوو».

پاش ئەمەی بێژرا، تێگەیشتی کە ئەوانەی بە چاوی دڵ دەبینن، باش دەزانن کێ لە عەزاوی گۆڕ، دەرباز دەبێ و هەروەها دەزانن کە زۆربەی خەڵکی، لەم عەزاوە دەخەلسن، بەڵام ماوەی عەزاو و چۆنییەتی ئازاریان جیاوازە، هەروەکوو چۆن هۆگریان بە دونیا جیاوازە.

## بەشی یازدەهەم: ڕێگای تاقی‌کردنەوەی بێوەی بوون لە ئازاری گۆڕ

تاقمێ لە خەڵکی ساویلکە و هیچنەزان دەڵێن: «ئەگەر عەزاوی گۆڕ ئەمەیە، ئێمە لێی دەربازین؛ چونکە ئێمە هیچ بەندیوارییەکمان بە دونیاوە نییە و بوون و نەبوونی لە لامان چوون یەکە.»

ئەم پەیڤەش تا تاقی نەکرێتەوە، ورێنەیەک زۆرتر چی‌دی نییە. ئەگەر هەرچی هەبوو، دز بیبا و هەرچی ئەم پێی خۆشە، کەسی‌تر ببێتە خێوی - لە نزیکانی - و هەموو دۆستانی ڕووی لێ

---

[1]- قورئان (١٩/ ٧١و٧٢) هەموو کەستان -ئیللا و بیللا- هەر دەبێ بچنە جەحەندەم، بڕیارێکە پەروەرندەی تۆ داویەتی و هەر دەبێ جێبەجێ ببێ، پاشان لە خوداترسەکان ڕزگار دەکەین. ناهەقانیش -دەستەوئەژنۆ- لە ناویدا دێڵینەوە. (هـ)

وەرگێڕن و جنێوی پێبدەن و ئەم دڵی نەلەرزێ و ئارامی بێئارام نەبێ و هەروەکوو ئەوەی بەسەر کەسێکی‌تردا هاتبێ وابێ، ئەوە ڕاست دەکا و بۆی هەیە بڵێ: «من ئاوەهام». بەلام تا لێی نەدزن و ڕووی لێ وەرنەگێڕن، بۆی نییە وا بڵێ و هۆی وتنی لەخۆبایی بوونە. کەواتە دەبێ چەش لە ماڵوسامان و حەز و داخوازی بکا و بەم چەشنە خۆی تاقی کاتەوە، پاشان دەتوانێ خەیاڵی ئارخەیان بێ. زۆر کەس گوتیان نین لە بەندیواری ژن و ئافرەتدا؛ کەچی کە لێک هەلاویردراون، ژیلەمۆی نێو کوانووی دڵیان گەشاوەتەوە و ئاوری ئەوین چڵوپۆی دڵیانی بە تەواوی سووتاندووە و شێت و هەڵوەدای کردوون.

ئەگەر نەتوانێ داوی دیلی دونیا لە ملی دڵیبپسێنێ، دەبێ بە چاودێری لە عیبادەت و یادی خودای مەزن، تووی ڤیانی خودانی خۆی لە دڵ بچێنێ - بە چەشنێک کە خۆشەویستی پەروەردگار سەرتر بێ لە خۆشەویستی دونیا. بۆ سەلماندنی ئەم واتایە، بەڵگەی دەوێ، بەڵگەش هەر ئەوەیە کە ناکەوێتە دووی وازوازی نەفس و ئەڵقەی کۆیلەیی خودا دەکاتە گوێ و لە ڕاستەڕێ، کلا نابێ. ئەگەر سەری بۆ نەفسی نەگریس نەوی کرد، نیشانەکەی ئەوەیە کە دڵنیایە لەوەی کە لە عەزاوی گۆڕ دەرباز بووە. ئەگەر وا نەبێ، دڵنیایە کە تووشی ئازاری قەبر دەبێ، مەگین ئەوەی بکەوێتە بەر بەزەیی پەروەردگاری.

## بەشی دوازدەهەم: سێجۆری ئاوری دۆزەخی ڕۆحانی (گیانی)

کاتی ئەوەیە کە ڕاڤەی دۆزەخی ڕۆحانی (گیانی) بکەین، ئەو ڕۆحانەی کە دانستەی گیانە نەک لەش.نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ٱلَّتِي , تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ[1] مەبەستی هەر ئەو ئاورە ڕۆحانییەیە کە بە سەر لەشدا دادەسەپێ و ئەو ئاورەی کە لە لەش بەر دەبێ، پێی دەڵێن ئاوری جەستەیی.

لە جەحەنەمدا سێجۆرە ئاور هەیە: یەکەم ئاوری دووری لە چێژ و حەزی دونیا؛ دووەم ئاوری شەرم و حەیا و ڕیسوایی و سێهەم ئاوری بێوەری بوون لە سەیری پەروەردگار و نائومید بوون لە دیتنی.

ئەم سێ ئاورەش کاریان بە دڵە نەک لەش. پێویستە ڕاڤەی ئەم سێئاگرە کە لە دونیاوە بردوویانە بکرێ؛ واتای ئەم پەیڤە بە نموونەیەکی خویان لەم دونیایە، ئاشکرا دەکەینەوە:

**یەکەمیان** ئاوری دووری لە شاوەتەکانی دونیایە، ئەم بابەتە لە ئازاری گۆڕا ڕاڤە کرا. ئەڤین لە خودا هەم بەهەشتی دڵە و هەمیش دۆزەخ. تا لەگەڵ خۆشەویستت بی بەهەشتە و کە لێی دابڕای لێت دەبێتە دۆزەخ. کەواتە، ئەویندای دونیا کە لە دونیا بێ، بۆی بەهەشتە و کە لێی دەرچوو لە

---

[1] - قورئان (٤/١٠٤ـ٦ـ٧) ئاگرێکە خۆدا هەڵی گیرساندووە، بەسەر پەرەی دڵاندادێ. (هـ)

دۆزەخایە، چونکە لە خوشەویستەکەی دابڕاوە. بۆیە یەک بابەت لە دوو دۆخی جیاوازدا هەم هەوێنی چێژ و خۆشییە و هەمیش هەوێنی دەرد و ڕەنج.

ئەم ئاگرە وەکوو ئەوەیە خونکارێک خێوی[1] زەڕ و زۆر و زیوی جوان بێ، بەردەوام لە گەڕان و سەیری جوانان بێ، خەریکی ڕابواردن لە نێو شۆڕەژن و کچان بێ، خاوەن کۆشک و تەلار و خانووی بەرز و جوان بێ، لە هەرچی مەمانان نەماندیوە بێ‌نیاز بێ. کەچی لەپڕ خونکارێکی‌تر، بەدەستەڵات و سامانتر بەسەریدا بدا و ماڵ و کۆشکی لێ بستێنێ، کچ و ژنی زۆر جوانی لە پێش هەردوو چاوانی بە کارەکەری ببەخشن، زێڕ و زیوی لێ بستێنن؛ جا حاڵی ئاوەها کەسێک کە لە پێش چاوی ژن و منداڵی بە بێگار بەن دەبێ چۆن بێ؟ هەردەم ئەڵێ بریا زوو بەزوو دەمردم و ئەم کارەساتەم نەدەدی. ئەمە خۆی ئاورێکە دەکەوێتە گیان و جەستەی. جا هەرچەندە ماڵوسامانی زۆرتر بێ، دەرد و ژانیشی زۆرترە. هەرچەند زۆرتر ڕایبواردبێ و دەرد و کەسەری کەمتر بووبێ، ژان و ئێشی گرانترە.

کەواتە هەرکەس لە دونیا خۆشتری ڕابواردبێ، زۆرتری ئەویندار بووە و دەرد و ژانی جیاییش بۆی زۆرترە و ئاوری جیایی بەتین‌تر دەیسووتێنێ. هەرچەن چجار[2] ئەو ئاورە لەم دونیایە وێنەیەکی بۆ نابینرێتەوە؛ چونکە لەم دونیایەدا کە مرۆ لە خۆشەویستی ڕادەبڕێ، بە کار و هەرمانی‌ترەوە خجل[3] دەبێ و دەردی فیراق کەمتری ئازار دەدا. بۆیە ئەو کەسە کە دەپەرژێتە سەر بابەتێکی‌تر، ئاگای لە خۆشەویستەکەی دەبڕێ و نەختێ ئێشی ئەهوەن دەبێتەوە، بەڵام کە لە کار دەبێتەوە ئێشەکەشی زۆرتر دەبێ و ئاورەکەی شەماڵە دەکا. بەم بۆنەیە کە مرۆی تووشی کارورەهات هاتوو، کە لە خەو بە خەبەر دەبێتەوە، ئێشەکەی زۆرتر دەبێ، چونکە کاتێ لە خەوندا بووە هەستەکانی لە هەرچی ئەم دونیایە پاڵفتەکراوە و دڵ و مێشکی لە خوڵەمێشی ئەم دونیایە و کردەکانی کە بەسەریاندا ڕۆنیشتووە، پاقژ بووە و هیچ بیرێک، بێجگە لە بیری خۆشەویست لە دڵیدا نەماوە. تەنانەت ئەگەر دەنگێکی خۆش لە خەو بە خەبەری کا، ژان و ئێشی فیراقی زۆرتر دەکا. بەڵام هێشتا بە خەونیش بە تەواوی لە هەست و خەم و خەیاڵی ئەم دونیایە پاکژ نابێ، مەگین بمرێ و ئەوسا بە تەواوی لەوەی کە هی ئەم دونیایەیە و وەکوو خۆڵەمێش بەسەر مێشکیدا نیشتووە، خاوێن بێتەوە و جا ئەوسا لە قورسی باری دڵی و تیژی ئاوری دووری دەگا. ئاگادار بە وا نەزانی ئەو ئاورە وەکی ئاوری ئەم دونیایەیە؛ ئاوری ئەم دونیایەیان حەفتا جار ئاو کێشاوە تا بۆتە ئەمەی کە دەیبینی.

---

١- خێو: خاوەن.

٢- چجار= هیچگا، هەرگیز.

٣ - خجل بوون= پەرژانە سەر کارێ.

**دانستەی ئاوری دووهەم:** ئەوەش ئاوری شەرم و شوورەییە لە ئابڕووچوون، لە ڕسوا بوون. وێنەی ئەمەش هەر ئەوەیە کە خونکارێک پیاوێکی پەست و چرووک بکاتە جێی متمانەی خۆی. ولات و ماڵوسامانی، زێڕ و زیو و ژن و منالی، هەرچی هەیە بەو بسپێرێ: بە هەمووشیان ڕابسپێرێ: ڕووبەند لە لای وی فڕێ دەن، وەکوو براتان سەیری کەن. کەچی کابرای پەستی نەیار بە چاوی پیس و بەتەماح سەیری ماڵ و منالی کا، لە هیچ خراپەیەک نەبوێرێ، لە زێڕ و زیوی وەلانێ[1]. کەچی لە خزمەت پادشا، خۆی بە پیاوی چاک دابنێ و جانماز بە ئاوا بکێشێ. بەلام ڕۆژێک تێبگا پادشا لە ڕۆژنەوە سەیری دەکا، ئەوسا وریا بێتەوە و بزانێ هەموو ڕۆژێ هەروا بووە، پادشا خەریکی سەیری بووە، بە ئانقەست بێدەنگ بووە تا باری تاوانی قورس بێ، تا ڕێگەی دەرچوونی نەبێ، بێجگە لە فەوتان چاری نەبێ.

جا بزانە دەبێ حالی ئاوەها پیاوێکی پیس و نەگریس چۆن بێ، ئاوری شەرم و شوورەیی چۆن لە گیانی بەر ببێ، کەچی لەشی بێوەیە، بەلام گیانی بێئوقرەیە. زۆری پێ خۆشە لەم کاتە، زەوی دەمی بکاتەوە و خۆی و تاوانی هەڵلووشێ.

کەسی برای! تۆش لەم دونیا دەپەرژێتە سەر کارێ کە لە ڕواڵەتدا چاکە، پاکە؛ بەلام لە ڕاستەقینەدا گیان و مەبەستی ناپاکە. کە لە ڕۆژی پەسلاندا ڕاستی ئەو کارەت لێ ڕوون بێ، شەرم و شوورەییت لێ خویان بێ، دەکەوێتە بەر پەلی ئاوری شەرم و خەجاڵەت. وەکوو ئەوەی ئەمڕۆ لەم دونیادا خراپەی کەسێک دەبێژی، لە دوارۆژدا دەبینی لەم دونیایەدا گۆشتی برای مردووت دەخۆی، لاشت وایە مریشکی سوورەو کراوە، ڕۆنی لێ داچۆڕاوە ؛ کەچی کاتێ وردەو دەبی، چ دەخۆی؟ گۆشت و خوێنی برات دەخۆی. بڕوانە چیت بەسەر دێ، چۆن خۆت لە خۆت بێزت دێ، چۆن ئاوری خەجالەت لە گیانت بەردەبێ. ڕاستەقینەی خوسپە[2] وایە؛ بەلام لە تۆ بەرپیوارە، لە دوا ڕۆژدا دیارە. لەم سۆنگەیە کە کەسێک لە خەوندا دەبینێ گۆشتی مرۆی مردوو دەخوا، شرۆڤەی ئەوەیە کە تووشی غەیبەت و خوسپە هاتووە.

ئەگەر ئەمڕۆ بەردێک باوێژییە پشت دیوارێک، کەسێک ئاگادارت کاتەوە و بلێ ئەو بەردە کەوتۆتە حەوشێی ماڵەخۆت، چاوی منداڵەکانت ئەنگاوتووە و جەرگەکانی خۆت کوێر کردووە. جا کە دەڕۆیتە ماڵی خۆت، دەبینی کە خۆشەویستەکانت کوێر کردووە، چ ئاورێکت لە گیان بەردەبێ و چ شەرمەزارییەکت تووش دەبێ؟ ئەوەی لەم جیهانەدا بەخیلی بە موسوڵمانێک ببا، لە دوارۆژدا خۆی لەم دۆخەدا دەبینێ؛ ڕاستەقینەی بەخیلی وایە، ئەتەوێ زیان بە کەسێک بگەیەنی کە لێت دوورە،

---

[1] - بدزێ.

[2] - خوسپە: غەیبەت.

کەچی زیانەکەت بۆخۆت دەگەڕێتەوە و خۆت دەپێکێ و دین و دونیات دەفەوتێنێ و هەرچەن بەندەگی خوات کردبێ - کە لەو دونیا ڕوونیای چاوتە - هەمووی پووچەڵ دەکاتەوە و دەکەوێتە سەر چاکەکانی ئەوەی ویستت زیانی لێ دەی. لە ئەنجامدا بێبەندەگی و بۆش و داماو دەمێنی؛ بەندەگی خوا لە دوارۆژدا بەکەلکترە لە چاوانی زارۆکانت، چونکە ئەوانە هۆی بەختەوەریتن، بەلام مندالانت لە دوارۆژدا هیچ کەلکێکت پێ ناگەینن.

کەواتە لەو دوارۆژەدا هەموو شتەک لە ڕواڵەتی ڕاستەقینەی خۆیدایە، شەرم و شوورەیی و خەجاڵەت لەوێدایە.

چونکە خەون بەو جیهانەوە نزیکە، کردەوەکان لە خەودا وەکی ڕاستەقینە دیارن. یەکێک بۆ لای ئیبنیسیرین هات و گوتی: «لە خەوما کلکەوانەیەکم بوو، مۆرم دەنا بەسەر شەرمگای ژنان و دەمی پیاوانا». ئەویش گوتی:«تۆ بانگبێژی و لە ڕەمەزانا بەرلە بەیانی بانگ دەڵێی؟» گوتی: «وایە». جا بزانە کە چۆن لە خەودا ئەم ڕاستییە پیشان درا؛ بانگ، یادی خودایە و لە ڕەمەزاندا، بۆ ئەوەیە خەڵکی لە خواردن و خواردنەوە و نزیکبوونەوە، پارێز کەن. سەیر لەوەدایە، لە خەونا ئەم شتانەت لە ڕۆژی پەسلان پێشاندەدەن، کەچی تۆ هیچ ئاگات نییە لەم واتانە؛ لە هەواڵدا وا هاتووە کە ڕۆژی پەسلان پیرەژنێکی دزێو و بەدفەڕ دێنن. هەموو دەڵێن:«نعوذ بالله منک»[1]. دەڵێن: «ئەمە هەر ئەو دونیایەیە خۆتان بۆی فەوتاند». وا بە خۆدا دەشکێنەوە دۆزەخیان سەدجار لەو شەرمەسارییە پێ چاترە.

وێنەی ئەم شەرمەسارییە وەکوو ئەو چیرۆکەیە کە دەڵێن: «پادشایەک، ژنی بۆ کوڕی هێنا. کوڕی لە نێو سوپا و خەڵکیدا خاوەن شانوشکۆ بوو، زۆر بەرز و هێژا و بەڕێز بوو. کاتێک بووکی گواستەوە، لە نێو کۆڕی جحێلانا بە زۆری شەراوی خواردەوە. ویستی بۆ لای بووک بڕواتەوە، لەسەر سەرینی سەر بنێتەوە، کامی دڵی پڕ لە حەزی بباتەوە. لەبەر مەستی، زۆر بە پەستی ڕێگەی ماڵی بووکی لێ بزر بوو، لە نێو شاردا ئاوارە بوو. لە دوورەوە ڕووناکیەکی بەدیکرد، لە ڕۆییندا زۆر پەلەی کرد. خانوویەکی دییەوە، بە خێرا ڕۆیشتە ژوورەوە. چەنکەس لەوێ ڕاکشا بوون، بانگی کردن، کەس نەبزووت، وای بیر کردەوە کە نووستوون. بینی یەکێکیان لەو لاوە، پەردەیکی سپی لەسەر کێشراوە، وتی دڵنیام ئەمە بووکە. خۆی لە پەنای ڕاکێشا، بۆنێکی خۆشی هەڵلووشا. هیچ گومانی نەما بووکە، عەتر و عەبیری لەخۆ داوە. بە توندی بە خۆیدا گووشی، دەمی لەسەر دەمی نا و زاری مژی، دەستی لە سنگی بەردا، تا بەیانی هەڵیگووشی. لەگەڵ بووکەدا جووت بوو، هەستی کرد گیانی تەڕ بوو، گوتی بووکە میهرەبانە، خەریکی گولاوپژانە. تا درەنگان مەستانە، خەریکی دڵداری بوو، ئینجا لەبەر

---

[1] ١- لە تۆ پەنا دەبەین بە خوا.

ماندوویی، لە ئامێزی بووکەدا خەونی خۆشی دەبینی.

بەیانی کە لە خەو هەستا، مەستی لەسەری ڕوا بوو و هۆشی هاتبووە بەر، سەیری کرد کە لە ژووری گاورانە، لە نێو کۆگای مردووانا و لە باخەڵی پیرەژنێکی پەرپووت و ناحەز و دزێو نووستووە. ئەوەی بە گولاوی زانی بوو، پیسایی پیرەژنە بوو. کە بە خۆیدا ڕوانی سەرتاپای لە پیسایی پیرەژنەدا خووسابوو. تفی تاڵ و تفتی پیرەژنی مردوو، زار و گەرووی سواخ دابوو. ئاواتی خواست بمرێ و زەوی زاری کاتەوە و نوقمی کا، کەس بەم ڕسوایی و بێئابڕووییەی نەزانێ. لەپڕ پادشا و سەربازان کە بە دوویدا هەڵوەدا بوون، دەرگای ژوورەیان کردەوە و...».

کەواتە لە دواڕۆژدا ئەوانەی دڵیان بە دونیا سپاردووە و لە نێو خۆشییەکانیدا نوقم بووگن، حاڵیان وایە و ئەوەی لەگەڵیان ماوەتەوە، جلوبەرگێکە لە شاوەت بەسەر دڵیاندا و وەکوو ئاسەواری ئەو پیسایی و تفت و تاڵیەیە لەسەر زار و ئەنامیاندا و بگرە لەوەش زۆر خراپتر.

ئەوەی کە هی ئەو جیهانە بێ، لەم دونیایە پیشان نادرێ، بەڵام ئەوەی بێژرا بۆ ئەوە بوو تۆزکاڵی لەو ئاورەی کە گیان دەسووتێنێ و لەش لێی بێخەبەرە و پێی دەڵێن ئاگری شەرم و شوورەیی بۆتان باس کەم.

**دانستەی ئاوری سێهەم:** ئاوری سوێ و تامەزرۆیی؛ ئەمەش بێوەری بوونە لە دیتنی بینایی چاوان و سوێ بوونەوە لە نەگەیشتن بەو بەختەوەرییە. هۆکەشی گەوجی و نەزانی و کوێرییەکە کە لەم جیهانەوە دەگەڵ خۆ براوە؛ ئازاری فێربوون و کۆشەوە بۆ زانین نەدانە بەر خۆ و دڵ نەپالاوتن و ڕوون نەکردنەوە بەو ڕادەی ڕوومەتی پەروەردگاری تێدا ببینرێ، پاش ئەوەی گیان ئەم جەستەی بەجێهێشت و بەرەو جیهانی هەرەمانەوە ڕۆیشت؛ چونکە گوناح و تاوان و شاوەت لە دونیا، دڵیان زەنگار گرتووە تا لە تاریکی و کوێریدا بمێنێتەوە.

وا بیرکەوە جارێک لەگەڵ تاقمی یاراندا، لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا، لە شوێنێکی نەناسراودا تێپەڕی. یاران بڵێن: «تا دەتوانی لەم وردو زیخەی ژێر پێت لەگەڵ خۆت بێنە، بیستوومانە گەلێک پڕخێرە». هەموو لە یارانت تا دەتوانن بار و بنە و توێشووی خۆیان لێی دەئاخنن، بێجگە لە تو کە یارانت بە گێل و نەزان دەزانی، کە ئەم ئازارەوە بەر خۆ دەنێن بۆ شتێک کە لە هات و نەهاتدا بێ. هەمووتان دەکەونە ڕێ، تۆ بە دەستی تاڵ و سووک، ئەوان باری گران و قورس. لە ڕێگادا پێیان پێدەکەنی و دەڵی: «هەرکەس وەکوو من ژیر و خاوەنفام بێ، بەختەوەر و ئاسوودەحاڵ بێ؛ ئەوەش لە فام بێبەش بێ ، وەکوو کەر بە ئومێدێکی بۆش و پووچەڵ، باری گران لە کۆڵ دەنێ». کاتێ بەرگی شەوگار دڕا، دەواری ڕۆژ لە ئاسمان هەڵدرا، یارانت کۆڵ و باریان کردەوە، چ ببینن؟

گەوهەر و یاقووتی سوور و جوان هەریەکەیان شارێ دێنێ، یارانت دەڵێن مخابن! بریا زۆرترمان دەهێنا! کەچی تۆ لە پەژیوانی سوێت دێتەوە، ئاوری پەشیمانی لە گیانت بەردەبێتەوە. ئەوان دەبنە دەسەڵاتداری سەرزەوی، هەر شوێنێک زۆر خۆش بێ دەڕۆن، تامی هەرچی خۆش بێ دەیخۆن، هەزارانی وەکوو تۆیان لە بەردەستا دێن و دەڕۆن. تۆش دەبیە سەپان و کۆیلەی بەردەستیان. هەرچەن لەبەریان دەپاڕییەوە کە: «لە سامان و ماڵ و خوانتان، پاژێکی بچووکم دەنێ أَفِيضُواْ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا[1]»، دەڵێن:«دوێنێشەو گاڵتەت پێکردین، ئەمڕۆ ئێمە گاڵتەت پێ دەکەین إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ»[2].

کەواتە، حەسرەتی لەدەس‌دانی بەهەشت و بینینی پەروەردگار، ئاوەهایە؛ ئەم گەوهەرانە، بەندەگی خودان؛ تاریکیش دونیایە و ئەوانەش کە گوتیان ئاسوودەیی ئەمڕۆ باشتر لە بەڵێنی سبەیە، هاوار دەکەن: «أفيضُوا عَلَيْنا مِنَ الْماءِ...». چۆن سوێ نەداتە دڵی کاتێ کە دەبینێ یەک سات بەختەوەری دواڕۆژ، هەموو دونیا دێنێ و یەک چرکەی ئازاری دۆزەخ، پتر لە هەزار ساڵ کوڵکێشانی دونیایە؛ تەنانەت ئەوەش کە لە دۆزەخ دێتە دەرێ، ئەوەندەی پێ دەبەخشرێ دەجار وەکوو ئەم دونیایەیە. ئەم بەراوردە بە پانتایی و پان و درێژی ناپێورێ، بەڵکوو گرینگ کاکڵەی ئەو نیعمەتەیە کە بریتیە لە چێژ و لەززەت.

### بەشی سێزدە: ئاوری گیان گەلێک شەماڵەی زۆرترە لە ئاوری لەش

سێ جۆر لە ئاوری گیانت ناسی. ئەوەش بزانە کە ئەم ئاورە گەلێک پترە لە ئاگری لەش، چونکە لەش تا گیان ژان نەیگرێ، بە هیچ ئێشێکی نازانێ. کەواتە ئێش لە لەشەو دەگاتە گیان و ئەوسا پتر دەبێ. بۆیە بێ‌شک ئاورێک کە لە گیاندا پێ‌بێ، گەلێک تین و سوێی زۆرترە؛ ئەم ئاورەش لە دەرەوە پێ نەکراوە، لە گیاندا هەڵکراوە.

هۆی هەموو ئێش و ژانێک، ئەوەیە کە شتێک کە لەگەڵ تەبع سازگار بێ، دژێکی بە سەردا زاڵ بێ. زاتی لەش خوازیاری مانەوە و لێک‌نەبڕانی بەشە جۆراوجۆرەکانیەتی؛ کە بەشێکی ئەم لەشە، بە

---

[1] - (قورئان، ۷/۵۰-۵۱) لەو ئاوە یا لەو ڕۆزیە خوا پێداون شتێکیش بەشی مە بدەن. ئێژن: خودا ئەم شتانەی بەشی بێ‌دینان نەداوە. ئەو کەسانەی دینەکەیان هەر بە گاڵتە و گەپ دەزانی. (هـ)

[2] - (قورئان، ۳۸/۱۱) بەم زوانە هەر وەک ئێوە گاڵتە دەکەن، ئێمەش گاڵتەتان پێدەکەین. (هـ)

بڕینێک لێکدابڕا، ئەوە تووشی دژایەتییەک هاتووە و ژان دەیگرێ. بڕین دەبێتە هۆی لێکهەڵاواردنی بەشێک لە بەشێکیتر، کەچی ئاور لە ورد و درشتی بەشەکان بەر دەبێ و هەموویان لێک دەکاتەوە: کەواتە لە هەر ئەنامێک ژانێک بەردەبێ و ئێشێک هەڵدەستێ. بۆیە ئێشی سووتان گەلێک زۆرتر لە ئێشیتره.

کەواتە، ئەو شتەش کە شیاوی تەبعی دڵە، کە ناکۆکی بەسەردا زاڵ بوو، ئێشی لە گیاندا زۆرترە. ئارامشی تەبعی دڵ لە ناسین و دیتنی خوایە؛ کوێری و ئامایی کە دژ بە تەبعی دڵە، کاتێ بەسەریدا داسەپا دەرد و ژانی لە وتن نایە. هەروەکوو چۆن دڵ لەم دونیا تووشی نەخۆشی دێتەوە، هەرواش کوێری و نابینایی یەخە و پێسیری[1] پێدەگرن. بەڵام چۆن کاتێک دەست و پێ دەتەزێ و تووشی سڕی و سستی دەبێ، نزیک بە ئاور بکرێتەوە هیچ بە خۆی نازانێ، کەچی کاتێک سستی و سڕی لەدەست و پێ ڕەوییەوە ئەوسا لەبەر ژانی سووتان خۆی ناگرێ؛ سڕی و سستی دڵیش وایە؛ تەنیا بە مردن دەسڕێتەوە و لەپڕ و نەکاو ئاور لە گیان بەر دەبێ. ئەم ئاورە لە شوێنیتر نەهاتووە، بەڵکوو لە ناخی دڵدا پێ بووە؛ بەڵام چونکوو ڕاستەقینەت نەزانیوە، تا ئەودەم کە لێت خویان بوو، نەتناسیوە:
كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ، لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ.

هۆی ئەمەی کە شەریعەت زۆرتر لە بەهەشت و دۆزەخی لەش ئاخاوتووە، ئەوەیە کە خەڵکی باشتر فامی دەکەن و تێیدەگەن. کەچی ئەگەر ئەم پەیڤە لە لای هەرکەسێک بکرێ، چوون لێی ناگا و فامی ناکا، بە سووک و بێبایەخی دەزانێ. وەکوو ئەوەی بە منداڵێکی لاسار بڵێی:«ڕۆڵە بخوێنە و لە ڕاهاتن ڕامەمێنە، ئەگینا لە گەورەیی و سەروەریدا نابیتە جێگر و جێنشینی بابت» ئەو منداڵە لێی تێناگا و لە دڵیدا قەد نانیشێ. کەچی ئەگەر پێی بڵێی: «مامۆستا شەپلاخەت لێ دەدا»، لەم هەڕەشەیە دەترسێ و دەیپەزێرێ. هەروەکوو لێدانی ماموستا ڕاستە، ئاگری بێوەری بوون لە جێگری باب وکالان لە سۆنگەی نەخوێندن و نەزانینەوە ڕاستە، دۆژەهی لەشیش ڕاستە و ئاوری بێبەش بوون لە سەیری سیمای پەروەردەگاریش ڕاستە. ئەوەش بەباشی بزانە کە دۆژەهی لەش لە ئاست ئەو ئاورە پڕ تینەی کە لە سۆنگەی نەدیتنی خوداوە لە گیان و دڵدا بەردەبێ، وەکوو تووڕە بوونی مامۆستا لە بەرانبەری نەگەیشتن بە جێگری باب و نیشتن لەسەر تەختی شاهییە.

## بەشی چواردەهەم: قۆناغەکانی سەیر و گەڕانی ڕۆح لە دونیا

ڕەنگە بڵێی ئەم پەیڤە ئاوەژووی وتەی سەرجەمی زانایان و پێشوونانە کە لە کتێباندا هاتووە؛ ئەوان دەڵێن ئەم کارانە لە وتننەهاتگن و بێجگە لە چاولێکەری و گوێڕایەڵی، ڕێگایەکتر بۆ بڕینی ئەم

[1]- پێسیر= یەخە، بەرۆک.

هەورازە شک نابەن.

باش بزانە دەسپێچی وان بۆ ئـەو بیـانووە پێـشتر بێـژرا. ئـەم وتەیـە پێچەوانـەی پەیـڤی وان نییـە، هەرچی ئـەوان لـە ڕاڤـەی دوارۆژدا وتوویانـە، هـەمووی ڕاسـتە؛ بـەلام لـە ڕاڤـەی بـەرهـەسـتەکـان (محسوسات) بەولاوە نەڕۆیشتوون؛ جا یا نەیانزانیوە، یا خۆیان لێ پـارازتووە، چونکـە زۆربـەی خەڵـک لێی تێناگەن.

ئەوەی پێوەندی بە لەشەوە بێ، تەنیا دەبێ بە شۆپی خاوەن شەرعدا پێی بگـەن. بـەلام ئـەم پـاژە، بەشی ناسەرەکییە لە ناسـینی ڕاسـتەقینەی ڕۆح، ڕێـی ناسـین و زانـینی وی لـە سـۆنگەی دیـتن و ناسینی دەروونـەوە دەبـێ. بـەم قۆناغـەش کەسـێک دەگـا پـشت لـە ولاتی خـۆی بکـا، نیـشتمانی بەجێبێڵێ و ڕوو لە دیاری دین بکا. مەبەستمان لە زێد و نیشتمان، ماڵ و خانییەک کە تێیدا دەژیـن نییە، ئەو نیشتمانی لەشە و سەفەری لەشیش بێبایەخە، ئـەو ڕۆحـەی کـە ڕاسـتەقینە و سـەرچاوەی نهێنییەکانی مرۆڤە، بنکە و مەکۆیەکی هەیـە، کـە هـەر ئاخێزگەشـی ئەوێیـە. زێـدی وی لـەوێیـە و سەرەتای سەفەرەکەشی هەر ئەو شوێنەیە. لە ڕێگادا چەنای چەن مەنزڵگای هەیە و هـەر مەنزڵـگاش جیهانی تایبەت بە خۆیە.

یەکەم مەنزڵ بەرهەستەکانە، پاشـان خەیالاتـەکان، ئینجـا وەهـم و وەژارە، مەنزڵـگای چـوارەمیش دەبێتە مەعقوولات؛ لەم مەنزڵگایە لە ڕاستەقینەی خۆی دەگا و پێش ئەمە هیچ ئاگای لە خۆ نەبووە.

مەنزڵگای **یەکەم**: ئەم مەنزڵگایەت بە وێنەیەک بۆ ڕوون دەکەم: مرۆ تـا لـە مەنزڵـگای بەرهەسـت بێ، وەکی پەپوولە چاوی هەیە، کەچی لە خەیاڵ بێوەرە. بە هومێدی گەیشتن بـە ڕوونـاکی و دەربـاز بوون لە تاریکی، خۆی لە پەنای ئاور دەدا، لەبەر زامی کـڵپەی ئـاور لـەوێ هەڵـدێ و دوور دەگرێتـەو کەچی دیسان وەکوو جاران بە ئومێدی گەیشتنە ڕووناکی خۆی لە نێو ئاگر بەردەدا؛ نـە جارێـک و نـە چەن جار تاکوو تەواو باڵەکانی دەپرووزێن و گلێر دەبێتەوە نێو ئاور و دەمـرێ. ئەگـەر پەپوولـە هێـزی خەیاڵی لەگەڵ بایە، جاری یەکەم تێدەگەیشت نابێ باڵی خـۆی لـە ئـاور بـدا. ئـەوی لـە مەنزڵـگای یەکەمدا، لە مەنزڵگای بەرهەستدا بێ، هێـزی بـە مێـشک ئەسـپاردنی بـیرەوەری، هێـزی خـەیاڵ و بیرئانینی سەربهوردان لە لای نییە.

مەنزڵگای **دووەم** هی خەیالانە. تا مرۆ لەم قۆناغە بێ، لەگەڵ چوارپێ هاوشانە: تا شتێک ئازاری پـێ نەدا، نازانێ خۆی لێ لابدا. کەچی ئەگەر تـەنیا جارێـک لـە کونێکـدا دەسـتی گـەزیا، چجـار بەوێـدا ناگەڕێتەوە.

---

١- شۆپ: شوێنپا.

مەنزڵگای **سێهەم** وەهم و وەژارەیە: کە مرۆ گەیشتە ئەم ئاستە، دەگەڵ مەڕ و ئەسپ هاوشانە، کە لە ئازاری نەدیتوو، پارێز دەکەن. مەڕێک کە قەد گورگی نەدیبێ، ئەسپێک کە تارمایی شێریشی نەدیبێ، کە لە دوور گورگ و شێریان بینی، بلەز و بەز لەبەریان هەڵدێن و باش دەزانن کە دوژمنن، گاو و فیل و حوشتر، لە شێر و گورگ زلترن، بەڵام لێیان ناترسن. ئەم دانستە لە دەروونیان چانراوە، تا دوژمنیان بناسن؛ بەڵام هێشتا لە کارەساتی دوارۆژ بێخەبەرن و ناتوانن لێی دوور بگرن.

مەنزڵگای **چوارەم** مەنزڵگای عەقڵ و ناسینە: کە مرۆڤ گەیشتە ئێرە، لە هەموو گیاندارەکانیتری تێپەڕاندووە. تا ئێرە چوار پێیان دەگەڵی بوون، بەڵام ئێرە لەڕاستیدا یەکەم قۆناغی مەنزڵگای جیهانی مرۆڤایەتییە. ئەو شتانەی کە هەست و خەیاڵ و وەهم پێی نەگەیشتوون، دەیانناسێ، لە کارەهاتی دوارۆژ ئاگادارە و لێی دوور دەگرێ، لە بیچم و ڕواڵەتی کارەکان تێدەپەڕێ و لە کاکڵە و ناوەرۆکیان تێدەگا. ڕادەی ڕاستەقینەی هەموو شتێک -کە هەموو ڕواڵەتەکانی دەگرێتەوە- دەناسێ. ئەو شتانەی لەم جیهانە دەبینرێن، بێسنوور و ڕادە نین؛ چونکە ئەوی بەرهەست بێ، لە ماک و تەن (جسم) چیتر نییە؛ ماک و تەنیش بێڕادە نین.

ڕەوت و ڕۆیینی لە جیهانی بەرهەستدا، وەکوو ڕۆیینە بەسەر زەویدا کە هەموو کەس بە چاکی لێی دەزانن بەڵام ڕەوتی لە مەنزڵگای چوارەمدا - لە پشکنینی ڕۆح و ڕاستەقینەی کارەکان - وەکوو ڕۆیین لەسەر ئاوە. ڕەوتی لە نێو مەوهووماتدا، وەکوو سەفەر بە گەمییەیە؛ ئاستی لە نێوان خاک و ئاوە. لە سەرووی مەنزڵگای مەعقوولاتدا، پێگەیەکە تایبەتی شانوشکۆی پێغەمبەران، خاسان و نزیکانی خوا، وێنەی ئەوەش وەکوو ڕۆیینە لە ئاسمان. بۆیە کاتێ لە خزمەت پێغەمبەردا گوتیان: «ڕاستە حەزرەتی عیسا بەسەر ئاودا تێپەڕیوە؟» فەرمووی: ڕاستە، **وَ لَو ازدادَ یَقیناً لَمَشی فی الهَواء**»؛ واتە: ئەگەر ڕادەی بڕواداری پتر بایە، لە ئاسماندا ڕێگای دەبڕی.

کەواتە مەنزڵگاکانی سەفەری مرۆڤ لە جیهانە بەرهەستەکانایە و لە ئەنجامدا و لە دوایینمەنزڵگادا دەگاتە ئاستی فریشتان. لە یەکەم ڕادەی چوارپێیان تا دوایین پلەی فریشتەکان، قۆناغ و مەنزڵگاکانی میعراج و بەرز بوونەوە و هەڵچوونی مرۆڤن، بەرز و نەوی و هەوراز و نشێوی کاری ئەون.

ژیانی مرۆڤ پڕمەترسییە، یا بەرەو هەوراز بەرز دەبێ، یا ڕوو لە نشیو گلێر دەبێ. باس لەم مەترسییە ئاوەها کراوە کە: «إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا

وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَـٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا[1]».

ئەوی دار و بەردە، لە ئاستی خۆی تێناپەڕی، کەواتە بێ‌وەی دەمێنێ. فریشتەکان لە «شوێنی هەربەرز»دان و ناتوانن لەم قۆناغەش ببزوونەوە و ڕادەی هەرکەس هەتاهەتایی بۆی دەمێنێتەوە، بۆیە گوتیان: «وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ[2]». چوارپێیان لە جێگای هەرە نزمدان، ئەمانەش قەد سەر ناکەون. مرۆڤ لە ناونجی ئەم دووانەیە و هەردەم لە مەترسیدایە؛ هەم دەتوانێ بەرەو هەوراز هەڵگەڕێ و لە فریشتەکانیش سەرکەوێ، یا خۆ بە شوێی چوارپێیان، ڕێگای نزمی بگرێتە بەر. مەبەست لە واتای «ئەمانەت»، قەبووڵی ئەم مەترسیەیە. کەواتە، بێجگە لە مروڤ کەس ناتوانێ باری ئەو ئەمانەتە لە ئەستۆ بگرێ.

مەبەست ئەوە بوو کە گوتت: «زۆربەی خەڵکی ئەم پەیڤەیان نەگوتووە». جا بزانە ئەمە شتێکی سەیر نییە، چونکە ئەوەی بەردەوام لە سەفەر و گەڕاندا بێ، دژ بە نیشتەجێ بووانە؛ زۆربەی خەڵکیش نیشتەجێ و بێ‌جووڵەن، بەدەگمەن کەسێک مسافر بێ. ئەوەی لە قۆناغی بەرهەست و خەیاڵدا کە مەنزڵگای یەکەمە، دەواری نیشتەجێ‌بوونی هەڵدا، قەد ڕۆح و ڕاستەقینەی بابەتەکانی لێ ڕوون نابێ و لە داب و دەستوور و یاسا ڕۆحانییەکان تێناگا. بۆیە ڕاڤەی ئەم بابەتە لە پەرتووکاندا زۆر کەمە.بەمەی بێژرا دوایی دێنین بە ئاخاوتن لەسەر ناساندنی دوارۆژ، چونکە زۆرکەس لەمەش کە بێژرا بە تەواوی تێناگەن.

## بەشی پانزدەهەم: گومان لە ڕۆژی پەسڵان بە هیچ جۆر شیاو نییە

هەندێ گێلۆکە و نەزان، کە نە دەتوانن بە ڕامان لە ڕاستەقینەی کار و بابەتەکان بگەن، نە ئەوەندەش ژیرن کە بە شوێی شەریعەتدا بڕۆن، کاری دوارۆژیان لا سەیرە، بە چاوی زاق و دەمی واق سەیری دەکەن. جا ئەو کاتەی کە شاوەت بەسەریاندا سوار بوو، هەوا و هەوەسی دەروونی حاشای دوارۆژی پێ ڕەوا بوو، شەیتانیش ئەم حاشایەی ڕازاندەوە و جوان و لووس و خوشیک لە پێشی دڵی ڕانا، وا بیر دەکاتەوە کە هەرچی لە دانستەی دۆژەهبێژراوە بۆ چاوترساندنی وییە و هەرچیش لە پەسنی بەهەشتا بۆی وتراوە، بۆخاپاندن و فریوی ئەوە. بۆیە چش لە شەریعەت دەکەن و بە شوێی شاوەتا دەڕۆن، بە سووکی سەیری پێڕەوانی شەریعەت دەکەن و دەڵێن:«ئەمانەی لە جووڵە جووڵن،

---

1- قورئان (٧٢/٣٣): ئێمە ئەم ئەمانەتییەمان لە بەرانبەر ئاسمان و زەمین و ئەو هەموو کێوانە ڕانا، هیچیان دەخۆیان ڕانەدی بچنە ژێری و لێی دەترسان. پاشان مرۆ وەستۆی خۆی گرت؛ کە نەیزانی و سەبارەت بە خۆی غەدری کرد. (هـ)

2- قورئان (١٦٤/٣٧): لە ئێمەدا هەر کامەمان جێگای بۆ دیاریکراوە. (هـ)

خاپێنراون».

جا گێلە پیاوێکی ئاوا کێ دەتوانێ بە بەڵگە و بورهان نهێنییەکانی بۆ خویان کـا. دەبـێ ئەوەنـدەی پێ بڵێین تا لەم پەیڤەدا ڕامێنێ کە: «گەرچی تـۆ پێـت وایـە سـەرجەمی سەدوبیـست و چـوار هـەزار پێغەمبەر و زانایان و خاسانی خوا، بە گشتی بە هەڵەدا ڕۆیـون و خـاپێنراون، تـۆ بـەم گـەوجی خۆتـە زانیت ئەمانە فریو دراون، وا بیر ناکەیتەوە کە ڕەنگە تـۆ ڕێگـات لـێ تێکچووبـێ؟ هەڵخەڵـەتابی و لـە ڕاستەقینە نەگەیشتبی؟ نەختێ نابێ بە خۆدا بچیتەوەو وا بیر کەیەوە نەکوا تۆ هەڵە بکەی کـە وێنـە و چەشنی عالەمی سەرووت لە عالەمی بەرهەستدا نەبینیوە؟» ئەگەر وابوو کە دانی بە هەڵـەی خـۆدا نـە ناو گوتی:«هەروەکوو چۆن لە لام ڕوونە، دوو پتر لە یەکـە، واشـم لـە لا ڕوونـە کـە ڕۆح، ڕاسـتەقینە و ژیانەوەی لە لا نییە؛ نە شێنی و ئاسوودەیی، نە ئازار و بێئۆقرەیی لە پاشی مەرگ تووشی نابـێ»، ئـەو کەسەعەقلی دۆڕاوە، ڕاستەقینەی لێ گۆڕاوە، لەو هۆزەیـە پـەروەردگار پێـی گـوتن: «وَإِن تَدۡعُهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ فَلَن يَهۡتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدًا »[1]. ئەگەر گوتی «ناتوانم بڵێم وا نییە، ڕەنگە وابێ، هەرچەنـد دوورە. بـەلام چونکە لێم بە تەواوی ڕوون نییە، بۆچی بۆ گومانێ دەرد و ئازاری خۆ پاراستن لە چێژ و خۆشـی دونیـا بدەمە بەر خۆ؟». پێی دەڵێین: «ئێستا کە دانت بەم پەیڤەدا نا، ئاوەز لەسەرتی پێویست دەکا ڕێگـای شەرع بگریتە بەر، چونکە مەترسی مەزن بە گومانی لاواز لە بۆسـەدا بـێ، دەبـێ خـۆی لـێ بپـارێزن. کاتێ بتەوێ خواردنێک بخۆی، کەسێک بێت و پێت بڵێ مارێکم بینی دەمی لەسـەر ئـەم خواردنـەت نابوو، ڕەنگە بە ڕاسبێژیچی نەزانی، بەلام بێشک ئـەو خواردنـە نـاخۆی و دەڵـێی ڕەنگـە درۆی دابـێ تاکوو من دەست لەو خواردنە بکێشم و ئەو بە تەنیا خۆی بیخوا، گەر بەم چەشنە بێ، تـەنیا برسـیەتیم پێ دەبڕێ، کەچی ئەگەر ڕاست بڵێ، ژیانم دەدۆڕێنم. یـا خـۆ ئەگـەر نـەخۆش کـەوی، دکتـۆران لـە دەرمانت ڕامێنن، نوشتەنووسێک پێت بـڵێ، درهـەمێکم پـێدەرێ، تـا بـە نوشـتەیەک چـارت کـەم، هەرچەند دڵنیا بی کە هیچ نوشتەیەک دەرمانی دەردت ناکا، بەلام دەڵێی ڕەنگـە پێـی بکـرێ چـارم کا، درهەمەی دەدەی تا نوشتەکەت بۆ بنووسێ. یاخۆ ئەگەر ئەستێرەناسێک پێـت بـڵێ کاتـێ مانـگ گەیشتە فلان شوێنی ئاسمان، فلان دەرمانی تفت و تاڵ بخـۆ دەردەکـەت سـارێژ دەبـێ. ئـەو ئـازارە دەدەیتە خۆ، دەرمانی تفت و تاڵ دەخۆی، دەڵێی ئەگەر ڕاستی گوتبـێ، ئـەوە خـۆ چـاک دەبمـەوە، ئەگـەریش درۆی دابـێ تـەنیا دەرمـانێکی تالـم خـواردووە. کەواتـە، لـە کـن هـیچ خـاوەنفامێـک، خاوەنعەقڵێک، پەیڤی سەدوبیستوچوار هەزار پێغەمبـەر و سـەرجەمی پاکـان و زانایـان، کـەمتر لـە پەیڤی ئەستێرەناسێک، نووشتەنووسێک، یا خۆ پزیشکێکی گاور نییە، کە لەسەر قسەی ئەوان ڕەنجـی

---

١- (قورئان، ٥٧/١٨) چەند بکۆشی شارەزای ڕێگەیان بکەی، هەرگیز بۆت ناکەونە سەر ڕێ. (هـ)

کەمت دەدایە خۆ تا لە ئازاری گەورە خەلاست بێ. جا کە تۆ جوان بیر کەیتەوە، کورتی عومرت لەم دونیایە بە ڕێژەی عومری هەتاهەتایی لە هەمبەر یەک ڕابنی، باش دەزانی عومری ئەم دونیایەت لە بەرانبەر ژیانت لەو جیهانیتر، دڵۆپێکە لە زەریایەک، چرکەیەکە لە سالانێک. جا کوو دەبێ بۆ چەن ڕۆژ هێمنی و ئاسوودەگی دونیا، عومر و تەمەنی هەتاهەتاییت بفەوتێنی و خۆت بخەیتە نێو ئازارێکی بێکۆتایی. کەسی برای! لەمەی بێژرا ڕامێنە و نەختێ بە خۆدا بچۆرەوە و بڵێ: «ئەگەر ئەمان ڕاست بڵێن و لە عەزابی هەتاهەتاییدا بمێنم، چ بکەم؟ ئاسوودەیی ئەم دونیایە، کە چەن ڕۆژە و بە خێرایی ئاوا دەبێ، چ قازانجێکی بۆم هەیە؟» واتای «هەتاهەتا» ئەمەیە کە ئەگەر دونیا پڕ لە هەرزن کەن، پاشان مریشکێک دابنێن، هەر هەزار ساڵ دەنکێک هەرزنی پێ بدەن، هەرزن دوایی دێت و کەچی «هەتاهەتا» هیچی لێ کەم نابێتەوە. ئازارێک بەم ڕادەیە - چ ڕۆح، چ لەش، چ خەیالی - چۆن لە ئەستۆ دەگیرێ و بە کۆڵ دەکێشرێ؟ تەمەنی دونیاش لە هەمبەری چەندە کورتە؟ هیچ خاوەن فام و ئاوەزێک نییە کە لەم پەیڤەدا ڕانەمێنێ و ژیرانە ڕێگا نەبڕێ و خۆی لەم کۆسپ و کەندەلانە بێکۆتاییە لانەدا، هەرچەند بێگومانیش نەبێ، دەرد و ئازاریشی کەم نەبێ. بازرگانان بە سواری پاپۆڕ و گەمیە ڕێگای پڕمەترسی زەریا دەگرنە بەر، هەمووی بە گومانی گەیشتن بە قازانج و سوود و بەر. مرۆڤ ئەگەر لە ژینی دواڕۆژ دڵنیا نییە، بەلام گومانێکی بچووک هەیە: کەواتە ئەگەر دڵی بە خۆی بسووتێ، بەزەیی بە خۆدا بێتەوە، ڕێگای بەختەوەری دواڕۆژ - هەرچەند لێی دڵنیا نەبێ - دەگرێتە بەر. بەم بۆنەوە حەزرەتی عەلی (خوای لێ ڕەزا بێ) کاتێ لەگەڵ خودانەناسێک دەئاخاوت، پێی گوت: «ئەگەر وابێ کە تۆ دەڵێی هەم ئێمە ڕەستین و هەم تۆ؛ ئەگەریش وا بێ ئێمە دەڵێین، ئێمە ڕەستین نە تۆ؛ تۆ لە ئازاری هەتاهەتایی دەمێنییەوە». ئەم پەیڤەی کە حەزرەتی عەلی گوتی، بە ڕادەی فامی خوانەشناسی بێئایین بوو، ئەگینا خۆی ئارخەیان بوو، هیچ دڕدۆنگی و گومانی نەبوو. بەلام لەوەش ئاگادار بوو، کە فام و ئاوەزی کابرای بێدین بۆ گەیشتن بە ڕێگای یەقین، کورت و نزمە. بەم چەشنە زانیت، هەرکی لە دونیا بێجگە لە توێشووی دواڕۆژ خەریکی کارێکیترە، زۆر گێل و گەوجە. هۆکەشی بیر نەکردنەوە و لە ڕاستەڕێ نەگەیشتنە؛ شاوەتی دونیا نایانهێلێ بیەرژێنە سەر بیرکردنەوە؛ ئەگینا چ ئەو کەسەی دڵنیایە و چ ئەو کەسەی بەگومانە، بە هۆی عەقڵەوە ناچارن خۆ لەو مەترسییە گەورەیە بپارێزن و ڕێگای هێمنی و ئاسوودەیی بگرنە بەر.

وەسسەلام؛ ئاخاوتن لەسەر ناسینی نەفس، ناسینی خودای مەزن، ناسینی دونیا و ناسینی دواڕۆژ کە لە ژێر ناوی سەردێڕی موسوڵمانیدا هاتبوو، دوایی هات.

## به ناوی خودای دەهندە و دلۆڤانە
## پشتن هەر بە ئەو دەبەستین

ئێستا کە لە سەردێڕی موسوڵمانی بوویتەوە، خۆت و خودات ناسی، لە دونیا و دوارۆژت گەیشتی، دەبێ بپەرژینە سەر کار و باری موسوڵمانی.

هەروا کە زانیت، بەختەوەری مرۆ کە لە گرۆی ناسینی خودا و نەفس و دونیا و دوارۆژایە، ئەم چوارە، بنەمای ناسینەن؛ ئەم چوارەش لە خوارەوە دێن، چوار ئەستۆندکی بەندەگین:

١ـ یەکەم ئەوەی کە خۆ بە عیبادەت بڕازێنیەوە؛ ئەم ئەستوونە پێی دەڵێن عیبادەت.

٢ـ دووەم ئەوەی کە ژین و هەڵسوکەوتت بەڕێز و ئیحترامەوە بێ. ئەم ئەستوونەش پێی دەڵێن کردەکان.

٣ـ سێهەم ئەوەی کە دڵ و هەناوت لە هەرچی پیس و پوخڵییە پاقژ بکەی. ئەمەش پێی دەڵێن فەوتێنەران.

٤ـ چوارەم ئەمە کە دڵی خۆت بە دانستەی بەرز و جوان و بەدەو[1] بڕازێنییەوە. ئەمەش پێی دەڵێن ڕزگارکەران.

---

١- بەدەو: جوان، چاک.

# کتێبی یەکەم- لە عیبادەتدا

لەمەشدا دە بنەما هەیە:

بنەمای یەکەم- چوونە سەر بڕوای ئەهلی سوننە

بنەمای دووەم- پەرژانە سەر فێرکاری و کۆ کردنەوەی زانیاری

بنەمای سێهەم- پاکژ کردن

بنەمای چوارم- نوێژ خوێندن

بنەمای پێنجم- زەکات دان

بنەمای شەشم- ڕۆژوو گرتن

بنەمای حەوتم- حەج کردن

بنەمای هەشتم- قورئان خوێندن

بنەمای نۆهەم- زیکر و یادی خودا کردن

بنەمای دەهەم- کاتەکانی عیبادەت کردن

## بنەمای یەکەم - چوونە سەر بیر و ڕای ئەهلی سوننە

باش بزانە ئەوی ئیسلامی هێنا، لەسەری پێویستە بە دڵ لە واتای «**لا اِلهَ اِلاّ اللّـه - مُحَمَّـد رَسُـولَ اللّه**» - کە بە زمان دەیڵێتەوە - بگات و بڕوای پێ بێ؛ بە چەشنێک هیچ لێی دڕدۆنگ نەبێ. کاتێ بە زار گوتی و بە دڵیش بڕوای پێ هەبوو - بەبێ دڕدۆنگی و گومان - بەستە بۆ ئەوەی پێی بڵێن موسوڵمان. بەڵگە و هۆ هێنانەوە لەم قوناغەدا پێویست نییە لەسەر هەموو موسوڵمانێک؛ چونکە پێغەمبەری خودا نەیفەرموو بە عارەبان لە دووی هۆکار و بەڵگە بن، لە بیری دیتنەوە و سڕینی لێڵی بن، بەڵکوو تەنیا بە دان پێدانان و بڕوا بەوەی بێژرا قنیاتی کرد. ئاستی زۆربەی خەڵکی لەم ڕادەیە تێناپەڕێ.

بێگومان کەسانێک هەن کە بە جوانی و پاراوی شێوەی ئاخافتن دەزانن. لە بنج و بناوانی هۆکانی دەکۆڵنەوە و وەرامی ئەم پرسەیان لە لایە و ئەگەر کەسێک لێڵییەک باوێژێتە نێو خەڵکەوە، دەرۆستی دێن و بە زمان و قەڵەم لە ناخی دڵ و مێشک دەیسڕنەوە؛ ئەم سنعاتە پێی دەڵێن:«کەلام». لە هەر باژێڕێک یەک-دوو کەسی وابن بەستە بە پەرسڤی ئەو پرسانە. جەماوەر بە گشتی خاوەنبڕوان و کەلامزانیش پۆلیس و پاسەوانی بڕوای خەڵکین.

بەلام ڕاستەقینەی زانین و ناسینی پەروەردگار، ڕێگەیەکیتری هەیە و بڕوای ئەم دوو تاقمەش دەسپێکی ئەو ڕێگایەیە. سەرەتای وی کۆشەوەیە (مجاهدت): تا کەسێک بە تەواوی تێنەکوشێ، لە کانیاوی ڕوونو پاکی ڕاستەقینەی نەنۆشی، بە تەواوی لەسەر دوا پلەی ڕاستی نەنیشێ، نابێ هیچ بانگەوازێ کا، چونکە بێشک زیانی پترە لە قازانجی. وێنەی ئەم ئاکارە ئاوایە کەسێک پێشی پارێزکردن لەو خواردنانەی هۆی نەخۆشین، دەرمانی خواردنی دەس پێ بکا؛ ئەم کردەوە مەترسی مردنی بۆ دێنێتە ئارا. چونکە ئەو دەرمانە لەگەڵ خلتی گەدەی وی دەبنە یەک و هیچ نابنە هۆی چارەسەری نەخوشییەکەی، دەردەکەشی پتر دەکەن.

ئەوەی لەسەردێری موسوڵمانیدا هاتە گوتن، دەسپێکێک بوو بۆ ناسینی ڕاستەقینە، تا هاندەرێک

بێ بۆ کەوتنە سەر ئەم ڕێبازە. کەس ناتوانێ لەم ڕێبازە بەردەوام بێ، مەگین ئەوەی لە دونیادا هۆگری هیچ شتەک نەبێ، دڵی لە لای هیچ هەر نەبێ، لە پێوەندییەکانی دونیا، ئازاد و ڕزگار و ڕەها بێ، هیچ شتێک بێجگە گەیشتن بە خودا، نەیپەرژاندبێتە سەر خۆ. ئەمەش دژوار و دوور و درێژە.

کەواتە، ئاماژەمان دێتە سەر ئەو شتەی هاندەری هەموو خەڵکە - ئەوەش بیر و بڕوای ئەهلی سوننەتە - تا هەرکەس تووی ئەم بڕوایە لە دڵی خۆی بچێنێ؛ ئەمەش تووی بەختەوەری دوارۆژە.

## دیتنەوەی بڕوای موسوڵمانی

باش بزانە تۆ ئافرێندراوی؛ تۆش ئافرێنەرێکت هەیە کە جیهان و ئەوەی تێیدایە، بە دەستی وی رسکاوە. ئەوەش تاکێکی بێئامباز و شەریکە؛ هاوتا و هاوشانی نییە؛ بوونی سەرەتای نییە؛ هەتاهەتاش هەیە و دوایی نییە؛ بوونی وی لە ئەزەل و ئەبەددا پێویستە، چونکە نەمان هیچ زەمان توخنی وی ناکەوێ. هۆی بوونی ئەو هەر خۆیە و هیچ کۆڵەکەیەکی نییە و هیچ شتیش لەو بێنیاز نییە، بوونی وی بە خۆیە و بوونی هەمووان بە ئەو.

## پەسن

خودا لە خۆدا نە گەوهەرە (جوهر) نە عەرەز؛ لە هیچ لەشێکدا دۆنادۆن [1] نابێ؛ لە هیچ شتەک ناکا و هیچیش لەو ناکا؛ نە لە ڕواڵەتدا دەگونجێ، نە بە چەند و چوون دەپێورێ؛ لەوەی کە بە بیر و مێشکدا دێ - ئەوەی لە چەند و چوونا بێ - پاک و پاکژ و پاراوە، ئەوانە هەموو دانستەی دەستکردەکانی وین، خودا لە هیچ دەسکردێکی خۆی ناکا، ئەوی لە وەهم و خەیاڵا بگونجێ، ئەم خولقاندوویە. وردی و درشتی و ئەژمار لە بارەگای وی نایێنە بەرچاو، چونکە ئەمانە هەموو دانستەی دەسکردەکانی وین، بەڵام ئەو خۆی دەسکرد نییە. بە هیچ تەنێک (جِسْم) بەندیوار نییە؛ لە هیچ جێ نییە و لە هەموو جێیە، چونکی نە جێگیرە و نە جێنشین. هەرچی لە جیهانایە لە ژێری عەرشی ویدایە، عەرشیش لە ژێر ڕکێفی ئەوایە، ئەویش لەسەرووی عەرشایە، نە بەو چەشنەی تەنێک لە سەرووی تەنێکیتر بێ، ئەو تەن نییە؛ عەرش هەڵگری ئەو نییە؛ بەڵکوو عەرش و ئەوەی لەسەر عەرشدایە، هەموو بە گشتی لەسەر باڵی ڕەحمەت و دەسەڵاتی وین. ئەمڕۆژ وەکوو ئەزەل وایە - ئەو دەمەی عەرشی خولقاند - نەگوڕاوە، هەتاهەتاش هەروا دەبێ، لە هەر ئاڵ و گۆڕێک دوورە،

---

[1] - دۆنادۆن- تەناسوخ؛ بیرو بڕوایەک کە دەڵین خودا لە لەشی هەندێ تاکی بژاردەی خۆیدا دۆن بە دۆن دەبێ و دێتە سەر دونیاوە و هەر هەزار ساڵ لە نێو لەشی مرۆڤێکی پیرۆزیتردا دێتە سەر دونیا.

دانستەکانیشی هەروا: ئەگەر ئاڵوگۆڕ بەرەو باری کەموکووڕی بێ، لە خوا بە دوورە، ئەگەر بەرەو تەواوتر بوون بێ، واتای ئەوەیە پێشتر کەم و کورتی بووە و ناچار بە تەواوتر بوونە، نیازمەند و بەلەنگاز دەسکردەکانن و ئەوانە کە شیاوی خوایی نین.

هەرچەن لە هەموو تایبەتمەندی دەسکردەکانی پاک و پاراوە، لەم جیهانەدا دەناسرێ و لەو جیهانیش دەبیندرێ. چۆن لەم جیهانە بێچەندوچوون دەناسرێ، لەو جیهانیش بێچەندوچوون دەبینرێ؛ چونکە ئەو دیتنە وەکوو دیداری ئەم دونیا نییە.

## دەسەلات

دیسان ئەمەش وەکوو هیچ شتێک نییە و بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە؛ هێز و دەسەلاتی تەواوە، هیچ کەم و کورتی و ناتەواوییەکی تێدا نییە، بەڵکوو هەرچی ویستووە کردوویە و هەرچی خواستووە بووە. حەفت ئاسمان و زەوی و عەرش و کورسی و ئەوەی هەیە، لە ژێر ڕکێفی دەسەلاتی ئەودا ملکەچ و سەرنگوونە.

هیچ شتێک لە دەستی کەسدا نییە. لە خولقاندنی ئەم جیهانە پان و بەرینەدا، هیچ یار و ئاریکار و شەریکێکی نەبووە و نییە.

## زانین

بەسەر هەموو زانیارییەکدا زانایە و لە هەموو شتێک ئاگادارە. خوار و بان، ورد و درشت، بەرز و نەوی، بێئیزنی وی قەد نابزوون، هەموو شتێ لە پێش زانستی ئەودایە، لەبەر دەستەلاتی ئەو ڕواوە. ژمارەی ورد و زیخی ساراکان، گەڵا و پەلکی گیا و داران، بیر و هزری نێو دڵان، وردیلەی زەمین و عاسمان، لە پێش چاوی خویانە و بەسەریان ئاگادارە، بەو جۆرەی لە ژمارەی ئاسمانەکان خەوەرداره.

## ویست و ئیرادە

هەرچی لە جیهاندایە، بە ویست و خواستی خوایە. هیچ شتەک - لە کەم و زۆر، لە خێر و بێر و شەڕ و شۆڕ، لە ورد و درشت، لە نەخۆش و تەندروست، لە سەربزێوی و بەندەگی، لە ئێش و ئاسوودەگی، لە کفر و ئیمان، سوود و زیان، لە تەواوی و لە نوقسان - بێویست و خواست و ئیزنی ئەو نابزوێن. ئەگەر هەمووان - لە جن و مرۆڤ و شەیتان - کۆوە بن و هان بدەن تا بەبێئیزن و خواستی ئەو، وردیلەیەک بجووڵێنن، داماو و دەستەوسان دەمێننەوە؛ بێجگە لەوەی ئەو بیەوێ ببێ، نابێ؛ ئەوەش ئەو وتی ببێ، هیچ شت و هیچکەس دەرۆستی نایێ: هەرچی هەیە و هەرچی دەبێ

هەموو بە ڕا و ویستی ئەوە .

## چاو و گوێ

هەروەکوو چۆن بەسەر هەموو زانیارییەک زانایە، بە هەموو بینراو و بیسراوێکیش، بینەر و بیسەرە. دوور و نزیک بۆ بیستنی ئەو، وەک یەکن، تاریک و ڕوون لە بەرچاوی ئاشکرایە. دەنگی نزمی مێرووڵەیەک، کە لە دڵی شەوێکی ئەنگوستەچاودا، بەسەر بەردێکی ساف و لووسدا تێدەپەڕێ، لە گوێی خودا شراوە نییە؛ ڕەنگ و ڕواڵەتی کرمێک کە لە ژێر خاکدا دەخشێ، لە پێش چاوی بەدوور نییە. دیتنی بە چاو نییە و بیستنی بە گوێ نییە؛ زانستی ئەو پێویستی بە ڕامان و بیرکردنەوە نییە و ئافراندنی پێویستی بە ئامراز نییە.

## پەیڤ

فەرمانی خودا بەسەر هەمووواندا گەرەک و پێویستە؛ لە هەرچی هەواڵی دابێ، دروست و ڕاستە. بەڵێنی و دڵدانەوەکانی، هەڕەشە و گوڕەشەکانی، بێشک و گومانن. فەرمان و هەواڵ، هەڕەشە و بەڵێن هەمو پەیڤی وین. هەروەکوو چۆن زیندوو و زانا و وینا و بیسەرە، بێژەریشە: دەگەڵ مووسا بێنێونجی ئاخاوت. پەیڤی خودا بە دەم و زار و دان نەبوو. پەیڤی خوا پیت و دەنگ نییە، واتە دەنگگەلی دابڕاو نییە؛ پەیڤ و قسەی خودای مەزن، پاکژتر و پاراوترە لەم دانستانە. قورئان و تەورات و ئینجیل و زەبوور و کتێبی سەرجەمی پێغەمبەران دەنگی وین و وتەی خودا، تایبەتی ئەوە و هەموو دانستەکانی کەون و هەتاهەتایین[1]. هەروەکوو چۆن زاتی خودای پاک و مەزن، لە دڵی ئێمەدا دیارە و بەسەر زاردا بێژراوە، زانیاری ئێمە لەسەر خودا عەرەزە و خودا قەدیم، بیرکردنی ئێمە عەرەزە و بیرکراو قەدیم، زاتی پەیڤی وی هەروا قەدیمە و لە دڵماندا پارێزراوە و بەسەر زارماندا بێژراوە و لە کتێبدا نووسراوە. پارێزراو قەدیمە و پاراستن عەرەز، خوێندراو قەدیمە و خوێندن عەرەز، نووسراو قەدیمە و نووسین عەرەز.

## کردەوەکان

جیهان و ئەوەی تێیدایە، هەموو دەسکردی وین. هەرچی خولقاند بە جوانترین و بەدەوترین چەشنی خولقاند. ئەگەر عەقڵی سەرجەمی ژیران لەسەر یەک کۆ بکرێنەوە تا دونیایەک جوانتر لەوەی خودا خولقاندوویە، یا لە هەڵسووڕانی جیهاندا شتێ بگۆڕن، یا خۆ شتێک کەم کەنەوە، یا خۆ

---

[1]- ئەمە بیر و بۆچوونی ئەشعەرییەکانە، کە دەڵێن قورئان قەدیمە.

شتێکی لێ زیاد کەن، پێیان ناکرێ. ئەوەش کە وای بۆ دەچن لەوە باشتر دەخولقێنن، تووشیاری هەڵە هاتوون و لە نهێنی ژیری وکارزانییەکەی نەگەیشتوون؛ ئەمانە وەکوو ئەو کوێرەن بڕواتە ژوورێکەوە، لەو ژوورەدا کۆتاڵی جۆراوجۆر لەسەر جێگای خۆیان بە تەکووزی داخرابن. کوێرەکە هیچێ نابینێ، دەکەوێتە سەر کۆتاڵ و بەتووڕەییەوە دەڵێ: «کێ ئەمانەی لەسەر ڕێگا داناوە؟» ئەوانە لەسەر ڕێگاوە نین؛ کوێرە خۆی ڕێگا نابینێ.

هەرچی خولقاند، بە تەواوی و بە ژیری و دادگەرانە خولقاندی؛ بەو چەشنەی خولقاندی کە دەبوایە بایەن. ئەگەر دەکرا باشتر لەوەی ئێستا هەیە بوایەن، هۆی ئەوە یا کەمهێزی و یا خۆ ڕژدی و چرووکی خوا بوو و ئەوەش قەد نابێ و لە خوا بە دوورە. کەواتە هەرچی خولقاند - لە ئێش و نەخۆشی و هەژاری و نەداری و نەزانی و ناتوانی - هەموو دادوەرانەیە. زوڵم لە خوداوە قەد ناشێ؛ چونکە زوڵم دەس‌وەردانە بەسەر وڵاتانی دراوسێدا. کەچی بۆ ئەو وڵاتی دراوسێ بێ‌واتایە؛ هەرچی‌هەیە و هەرچی دەبێ و هەرچی بووە، هەموو بەگشتی پەستی وین، ڕاهاتووی دەستی ویستی وین. پەروەردگار بێ‌هاوتایە و بێ‌نیاز و بێ‌شەریکە.

## پەسڵان

عالەمی لە دوو جۆردا خولقاندووە: عالەمی تەن (جسم)، عالەمی ڕۆح. عالەمی تەنی کردە هەوارگەی ڕۆحی مرۆڤ، تا تووی دوارۆژی بچێنێ و توێشووی ئەو دونیای کۆ کاتەوە. بۆ هەرکەسە ماوەیەکی دیاری کرد تا لەم دونیا بمێنێ. دوای ئەو ماوەیە، ئەجەلی ئەو کەسەیە و کەم و زۆریشی پێ ناکرێ. کاتێ ئەجەل گەیشت، ڕۆح لە لەش مالاوایی دەکا.

لە ڕۆژی پەسڵاندا - کە ڕۆژی پاداش و سزایە - گیان دەخاتەوە نێو لەش و هەموو پێکەوە هەڵدەستێنێ. هەرکەس بینەری کردەوەکانیە کە لە کاغەزێکدا نووسراوە؛ لە دونیا هەرچی کردبێ، لەوێ پیشانی دەدرێ. بە سنگ و ترازوویەک کە چەشنی لەم دونیا نییە، کردەوەی چاک و خراپی لە پێوانە دەدرێ و ئاشکرا دەکرێ.

## پردی سیرات (صراط)

ئەو کاتەی فرمان بە هەمووان دەدات تا لەسەر پردی سیرات بپەڕنەوە، پردێک باریکتر لە موو، تیژتر لە شمشێر. هەرکە لەم دونیایەدا لە ڕاستەڕێ لای نەدابێ، بە سانایی لەو پردە دەپەڕێتەوە؛ ئەوەش لە ڕاستەڕێ بوێرابێ و لە لاڕێوە ڕۆیبێ، لەو پردەدا سەرناکەوێ و سەرنخوونی دۆزەخ دەبێ.

لەسەر پردی سیرات، هەموو کەسێک ڕادەگرن و لە کردەوەی دەپرسنەوە، ڕاستەقینەی ڕاستی لە ڕاسبێژان دەخوازن و کردەوەی دوڕوو و مەراییان بە ڕوویاندا دەدەنەوە و لە پێش چاوی هەمووان‌دا بە

خۆدا دەشکنەوە و تووشی بێئابڕوویی دەکرێن.

تاقمێک بێ لێپرسینەوە دەڕۆنە بەهەشت، لە هەندێکیش بە سانایی دەبوێرن لـە جـوونێکیش[1] بـە دژواری دەپرسنەوە، لە ئاکامدا هەموو کافرەکان بۆ دۆژەهـ بەڕێ دەکـرێن و قـەد لـەوێ دەربـاز نـابن. ئەو موسوڵمانانەی لە پەیڤی خوا لایان نەداوە، دەخرێنـە بەهەشـت و لاڕێیـەکانیش دەخرێنـە دۆزەخ؛ هەرکەسیش کەوتە بەر تکای پێغەمبـەران، چـاو لـە گونـاحی دەپۆشـرێ و ئـەوەش تکـای بـۆ نـەکرا دەخرێتـە نێـو جەهەنـدەم و بـەڕادەی تـاوانی سـزا دەدرێ و پـاش ئـەوە لـەسـەر تکـای پێغەمبـەر دەیگێڕنەوە بۆ بەهەشت.

**پێغەمبەر**

کە خودای دلۆڤان ئاوەهای لە چارەی مرۆڤدا نووسی کە هەندێ لە کردەوەکانی هۆی بـەختیاری و بەختەوەری پاشەڕۆژن و برێکیان هۆی چارەڕەشی و قەرەبەختی. مرۆ لە خۆدا ئەم هۆکارانـە ناناسـێ، بۆیە خوداش لە سۆنگەی دەهندەیی و دلۆڤـانی خۆیـەوە فـەرمووی تـا ئـەو کەسـانەی کـە لـە ڕۆژی ئەزەلەوە لە لای خۆی تەواوترین بەختەوەری پێ دابوون، لەم نهێنییـە ئاگـاداری کردنـەوە و هەواڵـی پێدان تا ڕاستەڕێ و لاڕێ، بەختەوەری و چارەڕەشی بۆ خەڵکی ئاشکرا کەن، تا کەس بڕ و بیـانوو بـۆ خوای مەزنی دلۆڤان نەیرێتەوە.

پاش هەمووان، پێغەمبەری (سەلامی خوای لێ بێ) ئێمەی بۆ سەر خـەڵـکی نـارد، پێغەمبەرایـەتی پێ تەواو کرد، لە ئاستێکدا کە هیچکەس لەو پتر نەبوو. بۆیە ئەوی کردە دواییینی پێغەمبـەران و پـاش ئەم پێغەمبەریتر نایێ. فەرمووی بە هەمووان لە ئینس و جنان، پێڕەوی ئەم کەن. کـرا بـە سـەرۆکی پێغەمبەران؛ یاران و هەڤالانی بوون بە بەڕێزترین یارانی پێغەمبەران.«صَلَواتُ الله عَلَیهِمْ أجْمَعین».

1- جوون: تاقم؛ دەستە؛ کۆمەڵ.

## بنەمای دووەم- لە کۆکردنەوەی زانستدا

ئاگادار بە کە پێغەمبەری خودا فەرمووی: «طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ»، فێربوونی زانست، ئەرکە لەسەر هەموو موسوڵمانان.

هەموو زانایان لە پەرسڤی ئەم پرسیارەی کە «چ شتێک زانستە؟» ناتەبان. کەلامزانان (متکلمان) دەڵێن ئەمە زانستی کەلامە، چونکە خوای مەزن بەمە دەناسرێ. مەلایان دەڵێن، زانستی فیقهە کە حەرام و حەڵاڵ لێک هەڵداوێرێ. حەدیسوانان دەڵێن ئەمە زانستی حەدیس و سوننەتە کە شەرع لەسەری بنیات نراوە. سۆفییەکان دەڵێن ئەمە زانینی چۆنیەتی دڵە، چونکە ڕێگای گەیشتنی مرۆڤ بە پەروەردگارە.

هەریەک لەمانەزانستی خۆی لە لا جوانە. ڕای من وایە زانستێکی تایبەت نییە و ئەم زانستانەش لەسەر هەمووان پێویست نین. بەڵام بەو جۆرە ڕاڤە دەکرێ:

بزانە کەسێ کە چێشتەنگاو موسوڵمان بوو، یان باڵغ بوو، فێربوونی ئەم زانستانەی پێویست و لەسەر فەرز نییە؛ بەڵام هەر لەو کاتەدا لەسەریە واتای: «**لا اِلهَ اِلّا اللّه، مُحَمَّد رَسولُ اللّه**» بزانێ. ئەمەش بۆیە دەبێ بزانێ، کە لەسەر بڕوای ئەهلی سوننەتدا - کە لە بنەمای یەکەمدا هات - بێ. پێویست نییە بە وردی لە هۆ و سونگەی بزانێ، بەڵام دەبێ بە دڵ و گیان بیسەلمێنێ و بیپەزێرێ. پێویست نییە هەمووشی ڕاڤە بکرێ، کەچی دەبێ بە کورتی بە دانستەکانی خودا و پێغەمبەر و دانستەکانی دوارۆژ و بەهەشت و دۆزەخ و ڕۆژی پەسڵان باوەڕ بێنێ کە: خوایەکی هەیە بەو تایبەتمەندییانەوە کە پێشتر بێژران، لە لای خۆوە هەندێ داخوازی بە هۆی پێغەمبەرانەوە وتووە؛ ئەگەر دان بەو فەرمانانەدا بنێن و لە پەیڤی وی لانەدەین، پاش مردن بەختەوەری لە ئامێز دەگرین، کەچی ئەگەر لە ڕاستەڕێ لاماندا، ئەوا تووشی زیان و چارەڕەشی دەبین.

کاتێ ئەمەی زانی، پاش ئەمە فێربوو: ٠٠٠١ ح ٤٠٥ زانستی لەسەرە: یەکێ تایبەت بە دڵە و

ئەویتریان هی کردەوەی ئەندامەکانین.

ئەوەی تایبەتی ئەندامانە خۆی دەبێتە دووپاژ: یەکێک ئەوانەی دەبێ جێبەجێ بکرێن، دووەم ئەوانەی نابێ بکرێن.

بەڵام ئەوانەی دەبێ جێبەجێ بکرێن بریتین لە:

ئەگەر لە چاشتەنگادا بوو بە موسوڵمان، کاتی نوێژی نیوەڕۆ لەسەری پێویستە تارەت (**طهارت**) و نوێژ فێر بێ، بەو ڕادەی لەسەری فەرزە. بەڵام ئەو شتەی کە سوننەتە[1]، لە باسی سوننەتدایە نەک فەرز. بۆ وێنە ئەگەر گەیشتە نوێژی شێوان، دەبێ شارەزای ئەو نوێژە بێ کە سێ ڕەکاتە و بەر لەو کاتە پێویست نەبووە.

کە گەیشتە مانگی ڕۆژوو، دەبێ لە ڕۆژوو بزانێ: هەر ئەوەندە بزانێ دەبێ نییەت بێنێ و لە بەیانییەوە تا خۆراوا لە خواردن و پێوەندی ژن و مێردی خۆ بپارێزێ.

ئەگەر بیس دیناری زێڕی هەیە، لەو دەمەدا زەکاتی لەسەر نییە؛ کەچی کە ساڵێک ڕابورد، لەسەری پێویستە بزانێ کە زەکاتی ئەو زێڕەی چەندە و دەبێ بیداتە کێ و مەرجی زەکاتدانیش چۆنە.

حەجکردنی لەسەر نییە تا ئەو کاتەی ویستی بڕوا، کاتەکەشی پاژێ لە تەمەنە.

بەگشتی هەر ئەرکێک کە لەگەڵی ڕووبەڕوو دەبێ، هەر ئەو کاتە زانینی ئەوەی لەسەرە. وەکوو ئەوەی کاتێ ویستی ژن و منداڵ پێکەوە بنێ، عیلمی ئەو کارەی لەسەر پێویستە؛ وەکوو ئەوەی بزانێ مافی ژن چییە بەسەر پیاودا، لە کاتی مەهک و عادەتی مانگانە و پاش ئەوەش تا تەواوی خاوێن بێتەوە و غوسڵ بێنێ، نابێ توخنی خێزانی کەوێ؛ بەگشتی هەموو ئەومافانەی ژن و پیاو بەسەر یەکدا هەیانە. ئەگەر پیشەسازێکە، زانینی پێوەندییەکانی ئەو پیشەیە لەسەر پێویستە؛ یاخۆ ئەگەر بازرگانە، دەبێ ڕوبا و نزوول باش بناسێ، هەروەها مەرجەکانی بازرگانی بەتەکووزی لەبەر کا، نەکوا حەڵاڵ و حەرام ئاوێتە کا. بەم هۆیە بوو کە عومەر، دەیگوت ئەوەی لە زانستی (فیقهی) بازرگانی نەزانێ، نابێ خەریکی مامەڵە بێ؛ چونکە تووشیاری سوود و نزوول دێ و خۆشی بێخەبەرە.

بەمجۆرە کە هەر کارێک زانستێکی هەیە: خوێنگیر و حەجامەتکێش دەبێ بزانێ کام بەش لە گۆشتی مرۆڤ بە بڕین دەشێ، کام دان دەبێ بکێشێ، تا چ ئاستێ بۆی دەکرێ خۆ لە مەترسی بدا و بۆ برین دەرمان بنوێنێ و... .

ئەمە ئەو کارانە بوو کە دەبوا بکرێن، بەڵام ئەو کارانەی لە کردن نایەن:

---

١- سنت، مستحب: کردەوەیەک کە ئەگەر موسوڵمانێک بەجێی بێنێ، پاداش و خێری هەیە؛ ئەگەر بە جێی نەهێنێ، سزای نییە.

زانینی ئەم زانستەش پێویستە، بەڵام بۆهەرکەس جۆرێکە. ئەگەر کەسێک بخوازێ بەرگی ئاوریشمین لەبەر کا، یا خۆ گۆشتی بەراز بخوا، یا لە خانەیەک بنیشێ بە زۆرە ملێ ئەستێندرابێ، یا ماڵێکی حەرامی لە دەستدا بێ، لەسەر زانایان پێویستە تا ئەو زانستەی پێ فێرکەن، لەو حەرامانەی بگەینن، تا لەو کارەی دەست ڕاگرێ.

ئەگەر لە شوێنێکدا بێ کە لە ژنان نزیک بێ، لەسەری پێویستە بزانێ مەحرەم و نامەحرەم لێکهەڵاوێرێ و بزانێ کێ مەحرەمە و کێ نامەحرەم، هەروەها ڕوانین بۆ کێ حەرامە و بۆ کێ حەرام نییە.

ئەمەش بۆ هەرکەس جیاوازە؛ ئەوەی کارێکی لە پێشە، لەسەری نییە زانستی کاری کەسانیتر فێر ببێ. بەڵام ئەوەی پێوەندی بە دڵەوەیە، دوو جۆرە: یەکێکیان هی حاڵ و دۆخی دڵە و ئەویتریان هی بڕوایە.

ئەوەی بە بارودۆخی دڵەوە بەندیوارە، بریتیە لەوەی کە پێویستە بزانێ لووتبەرزی و دەمارزلی، ڕژدی و چڵێسی، مەرایی و زمانلووسی، ڕقوقین، دڵپیسی و خانووگمانی و... حەرامن. ئەمەش لە هەمووان دیارە و کەس لەم دانستانە بێبەش نییە. کەواتە ناسینی ئەم دەردانە و ڕێگە چارەیان پێویستە. چونکە ئەمە نەخۆشییەکی گشتییە و بەبێ زانست دەرمان ناکرێ. بەڵام زانستی مامەڵە و بەیع و سەلەم و کرێ و ڕەهن و ئەو بابەتانەی لە فیقەباس دەکرێن، فەرزی کیفایەتن. بەسەر کەسێکدا فەرزی عەین دەبێ بە تەمای توجارەت و بازرگانی بێ، چونکە زۆربەی خەڵک بازرگان نین، کەمتر پێویستیان بەمانەیە، بەڵام دڵ لەم بارودۆخانە بە دوور نابێ.

جۆرێکیتر کە پێوەندی بە بڕواوە هەیە، بریتییە لەوەی کە گەر لە بڕوایەکی سەرەکیدا کە هیچ گومانی تێناچێ، دڕدۆنگ بوو، دەبێ بەخێرایی دڵ و مێشکی پاقژ کا و لە لێلی و گومانی بسڕێتەوە.

پاش ئەم پەیڤە خویان بوو کە زانین لەسەر هەموو موسوڵمانان فەرزە و هیچ موسوڵمانێک لە زانست بێنیاز نییە. بەڵام زانست یەکجۆر نییە و بۆ هەمووان یەکچەشن نییە، بەڵکوو بە ڕێژەی حاڵ و سات لە گۆڕاندایە. بەڵام هەموو کەس بە چەشنێ پێویستی پێیە. بۆیە مستەفا فەرمووی: «هیچ موسوڵمانێک نییە فێربوونی لەسەر پێویست نەبێ»؛ واتە فێربوونی زانستێک کە لە کردەوەدا بە کەڵک بێ.

**سەرنج: بڕ و بیانووی بێزانستی لە دیندا پارە ناکا**

ئێستا کە ئاشکرا بوو فێربوونی ئەو زانستانەی کە لە ژیندا بەکەڵک دێن، لەسەر هەمووان پێویستە، زانیت کە نەخوێندەوار بەردەوام لە مەترسیدایە؛ ڕەنگە لە ژیندا تووشی کارێک بێ و بەهۆی نەزانی و

نەخوێندەواریوە نەزانێ حوکمی شەرعی لەسەرە. بۆ ئەم زیانەشی هیچ بڕ و بیانوویەک - کە نەمزانیوە و نەزان حوکمی لەسەر نییە - پارە ناکا و گوێی پێنادرێ[1].

بۆ وێنە ئەگەر کەسێ لە کاتی عادەتی مانگانە توخنی ژنی بکەوێ یا خۆ پێش لە خۆشوردن و غوسلی ژنی، بە نیازی ژن و مێردی بڕواتە لای، پاشان بڵێ: «لەم تاوانەم نەزانیوە»، بڕ و بیانووی هیچ ناهێنێ.

هەروەها ئەگەر ئافرەتێ بەرلە بەیانی و ڕۆژهەلات، پاک و پاکژ بووبێتەوە و نوێژی شێوان و خەوتنانی نەخوێندبێ و بلێ ئەم زانستەم نەزانیوە، یاخۆ پیاوێ لە ژنی مەهک[2] و نەخۆشی مانگانەی، جوێ بێتەوە و بلێ نەمزانیوە نابێ ژنی مەهک تەلاق بدرێ، پەروەردگار هیچ لە تاوانی خۆش نابێ. پێی دەڵێن: «پێمان گوتی فێربوونی زانست پێویست و فەرزە. بۆچی دەست لەم فەرزە شوشت، تا تووشی حەرام هاتی؟» مەگین ئەوەی کۆسپێکی بۆ هاتبێتە پێش و ئەم فەرزەی لەسەر لابرابێ و لەو سووچ و گوناحە بەری بێ.

**سەرنج: هیچ کردەیەک بەرزتر لە فێربوونی زانست نییە**

کە زانیت نەخوێندەوار لە مەترسی دەرباز نابێ، خویان دەبێ کە هیچ کارێک کە مرۆ دەپەرژێتە سەری، بەرزتر و دڵبزوێنتر لە فێربوونی زانست نییە. هەموو کارەکانی مرۆڤ، کە خۆیان پێوە مانوو دەکەن، بۆ کاروباری دونیایە، بەلام فێربوونی زانست لە دونیادا لە سەرووی هەموو پیشەیەکە. ئەوانەی بە دوای زانستدا وێڵن، لە چوار دەستە زۆرتر نین:

یا کەسێکە کە بە قەدەر نیازی لە دونیا بەشی هەیە، جا بە میرات یا بە هەر هۆیەکی‌تر: زانست، پاراستنی مالی وییە، هۆی شانوشکۆ و بەرزی و بەڕێزییە لە دونیا و بەختەوەرییە لە دوارۆژ.

ئەویتر کەسێکە کە نەدارە، لە مالی دونیا هەژارە، بەلام لەوەی هەیە چاوی تێرە، نەفسی بەرزە و بەوەی هەیە ڕازییە؛ ئاست و بایەخی هەژاری دەزانێ لە موسولمانیدا، کە هەژاران پێنجسەدساڵان پێش دەولەمەندان دەڕۆنە بەهەشت. زانست بۆ ئەم کەسانە هۆی ئارخەیانی دونیا و بەختەوەری دوارۆژە.

تاقمی سێهەم ئەوانەن کە دەزانن کە فێری زانست بوون، ماڵوسامانی پاک و حەلال، یان لە موسولمانان یا لە بەیتولماڵ دەستیان دەکەوێ، بەو ڕادەی نیازەکانی جێبەجێ بێ. بەبێ ئەوەی لە

---

١- مرۆڤی ژیری خاوەنفام پێش لەوەی توخنی کارێ بکەوێ، لە سوود و زیانی دەکۆلێتەوە؛ جا نەک تەنیا سوود و زیانی دنیایی، بەلکوو سوود و زیانی دوارۆژ گرینگترە.

٢- مەهک- خوێنی ژنانە.

دووی ماڵی حەرام بێ، یا مووچەخۆری پادشای خوێنخوار بێ.

کەواتە، بۆ ئەم سێ تاقمە، لە دونیـادا هەڵـوەدابوون بـە شـوێن زانـستدا لـە هـەموو شـت بـەرزتـر و پیرۆزترە.

چوارەم کەسێکە ژینی بە دژواری ڕادەبووری، مەبەستی لـە فێربـوونی زانـست کۆکردنـەوەی ماڵـی دونیایە؛ ڕۆژگاریش وایە بێجگە لەوەی ببێتە مووچەخۆری پادشا ـ کە سـامانی لـە پیتـاک و خـەراجی زوڵم کۆوەکراوە – و لە خەڵکی بەڕێز و بەرز و بە حورمەت پارە نەسێنێ. ئەم کەسە و هـەموو ئەوانـەی بە مەبەستی ماڵوسامان، خەریکی فێربوونی زانستن، چاکتر وایە خەریکی پیشەیەکی‌تـر بـن – پـاش ئەوەی لەو زانستانەی کە فەرزی عـەینن (فـرض‌العـین) بـووەوە – چونکـە ئاوەهـا کەسـێک، دەبێتـە شەیتانێک لە شەیتانە مرۆڤەکان و خەڵکێکی زۆر دەفەوتێنێ؛ کـە خەڵـکی ڕەمـەکی و نـەخوێنـدەوار سەیری دەکەن و دەبینن بە خاپاندن و گزی و فزی پارەی حەرام کـۆوە دەکـا، چـاوی لـێ دەبـڕن و دەکەونە دووی؛ بەم چەشنە زیان و خەساری پتـر لـە خێـر و چاکەیـە. کەواتـە لـەم چەشـنە زانایانـە هەرچەن کەمتر بن باشترە، چاکتر وایە بە هۆی کاری دونیاییەوە ماڵوسامان بەدەستبێنێ، نـەک لـە سۆنگەی کاری دین و دواڕۆژەوە.

ئەگەر کەسێک بڵێ: زانستی مرۆڤ دێنێتەوە سەر هێڵی ڕاست، وەک دەڵێن: «تَعَلَّمْنـا الْعِلْـمَ لِغَیْـرِ اللهِ فَأَبَی الْعِلْمُ أنْ یَکُونَ الاّ للهِ»؛ واتە، بۆ ناسینی خوا نەبوو کە پەرژاینە سەر فێربوونی زانست، کەچی زانـست ئێمەی بردە سەر ڕێگای پەروەردگار.

پەرسڤی ئەم پەیڤە ئەوەیە کـە: ئـەوە زانـست قورئـان و سـوننەت و نهێنییـەکانی ڕێگـای دواڕۆژ و ڕاستییەکانی شەریعەت بوو کە بردینیە سەر ڕێگای خودا، هەروەها هۆکەشی لە نـاخی دڵـی خۆیانـدا بوو؛ کاتێ کاربەدەستێک بوون لە کاری دونیا و گەورەپیاوانی دینیـان دەبـینی کـە خۆیـان لـە دونیـا پاراستووە، تامازرۆ بوون ڕێگای ئەوان بگرنە بەر. چونکە زانستێک کە فێری دەبوون، بـەم جـورە بـوو و بارودۆخی ڕۆژگاریشیان وادەبینی، هێڤیدار بوون بەرەو ئەو زانـستە وەرگـەڕێن و پێـڕەوی بـن، نـەک زانست پێڕەوی ئەوان بێ.

بەلام ئەم زانستانەی لەم ڕۆژگارەدا باون –وەکوو «خەلاف»[1] مەزهەب، کەلام، قیـسەس (قـصص) و طامات– و ئەو مامۆستایانەی لەم ڕۆژگارەدا هەن و زانـستی خۆیـان کردۆتـە داوێـک بـۆ ڕاوی دونیـا، پێوەندی لەگەڵ ئەمانە و فێربوونی زانست لای ئەوان، نابێتە هۆی وەرگەڕانـدنی مـرۆڤ لـە دونیـا؛ «وَ

---

١- خەلاف (علم خلاف): زانستێک کە باس لە چۆنییەتی بەڵگەهێنانەوە بۆ بابەتە شەرعییەکان و کەم و کووڕی هۆ و بەڵگە ناتـەباکان دەکات. لەڕاستیدا شەڕەقسەیەک (جَدَل) کە پێوەندی بە بابەتە ئایینییەکانەوە هەیە.

لَیْسَ الْخَبَرُ کالْمُعَایَنَة»[1]. بڕوانە ئەم کەسانە لە زانایـانی دونیـان یـا دوارۆژ؛ خەڵـکی لـە دیـتنی ئەمانـە تووشی زیان دەبن یا خێر.

بەڵام ئەگەر لە شوێنێکدا گەورەپیاوێکی لـەخواترس و پارێزگـار لـە سـەر شـۆپی زانایـانی ڕابـردوو، خەریکی فێرکاری و ئامۆژگاری خەڵکی بێ و لـە خوایـان بترسـێنێ و لـە دونیـا بیانپـارێزێ، دیـتن و ئاخاوتنی ئەم کەسە بۆ هەمووان خێر و بێرە، تا چ بگـا بـە فێرکـاری. جـا کاتـێ کەسـێک زانـستێکی بەخێر و قازانج فێر بێ، لە هەموو کارەکانی‌تری سەرتر و پیرۆزترە. زانستی بە سـوود و قـازانج ئەوەیـە، خراپەی دونیا خویان بکا، مەترسی دوارۆژی بۆ ئاشکرا کا و گێلـی و نـەزانی ئـەو تاقمـەی ڕوویـان لـە دونیا و پشتیان لە دوارۆژە، پیشان بدا، تا نەخۆشی لووت‌بەرزی، ڕژدی، مەرایی، خۆبـەزل‌زانی و چـڵ و هەڵپە و دونیادۆستی چارە بکا. ئەم زانستە بۆ ئەو کەسەی چڵ و هەڵـپەی دونیـای زۆرە، وەکـوو ئـاوە بۆ تینوو، یا دەرمانە بۆ دەردەدار.

بەڵام خەریک‌بوونی ئەم کەسەبە فیقەو کەلام و خەلاف و وێژە، وەکوو نەخوشـێکە دەرمانـێ بخـوا و دەردی قووڵـتر بـێ. زۆربـەی ئـەم زانـستانە گـەرای ڕژدی، مـەرایی و زمانلووسـی، فیـز و دەمـار و خۆبەزل‌زانی، دوژمنایەتی و سستی و پەستی و دونیاویستی دەپژێننە دڵ و هەرچەند زۆرتر بخوێنـێ، لە دڵیدا قووڵتر ڕۆدەچێ. کە لەگەڵ تاقمێکدا تێکەڵاو بوو کە سەرجەمیان خەریکی ئـەم کـارەن، وای لێ دێ کاتێک ویستی لەم ڕێگا بگەڕێتەوە، تۆبە و گەڕانەوەی لەبەر دژوارە و بۆی ناکرێ.

---

١- بیستن کەی دەبێتە وەکوو دیتن.

## بنەمای سێهەم – باسی پاکی و تارەت

بزانە خوای دلۆڤان و مەزن فەرمووی: «إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ[1]». خودا پاکانی خۆش دەوێ. پێغەمبەر فەرمووی: «الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمانْ»؛ پاکی نیوەی ئیمانە. هەروەها فەرمووی: «بُنِيَ الإِسْلامُ عَلَى النَّظافَة»؛ بناغەی ئیسلام لەسەر پاکی دارێژراوە.

پێت وانەبێ ئەم هەموو بەرزی و سەرترییەی پاکی لە جلوبەرگدایە کە بە ئاو پێک دێ؛ بەڵکوو پاک و پاراوی لە چوار قۆناغە:

**قۆناغی یەکەم**: پاکی دڵە لە هەرچی بێجگە لە خوایە. وەک دەڵێ: «قُلِ ٱللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ»[2]. مەبەست ئەوەیە کاتێ کە لە هەموو شتێ بێجگە لە خوا پاراو کرا، دەپەرژێتە سەر خودای مەزن و تێیدا نوقم دەبێ.

ئەمەش لە ڕاست گەڕانی پەیڤی «لا الهَ الّا الله»یەو ئاستی بڕوای چاکانی خوایە (صدیقان). پاک و پاراو بوون لە بێجگە خوا، نیوەی ئیمانە، چونکە دڵ، تا لە بێجگە خوا پاکژ نەبێ، بە یادی خوا ڕازاوە نابێ.

**قۆناغی دووەم**:پاکی ڕواڵەتی دڵە لە ئاکاری پیس و ناحەزی وەکوو ڕژدی و چرووکی و مەرایی و دوژمنی و قین و سستی و پەستی و...، تا بە ئاکاری بەرزی وەکوو قەناعەت، پەژیوانی لە گوناح، پشوودرێژی و کاوەخۆیی و ترس و هیوا و خۆشەویستی و... برازێتەوە. ئەمەش ئاستی بڕوای پارێزکارانە. پاکی لە ئاکاری نەوی، نیوەی ئیمانە.

**قۆناغی سێهەم**: پاکی و پاراوی ئەندامانی لەشە لە تووشیاری بە گوناحی وەکوو: خوسپە[3] و

---

١- قورئان (٢/٢٢٢): خوا لەو کەسانەی خۆشی دێ کە لە گوناح پەژیوانن و دەیانەوێ بە پاک و خاوێنی بژین. (هـ)

٢- قورئان (٦/٩١): بێژە خوا و ئیتر وازیان لێ بێنە. (هـ)

٣- خوسپ= غەیبەت.

پاشەملە گوتن و درۆ و حەرامخۆری و دۆخمان[1] و خەیانەت و سەیری نامەحرەم و...؛ تا بە ئەدەب و کاری چاک برازێتەوە. ئەمەش ئاستی بڕوای پارسایانە. پاککردنەوەی ئەندامانی لەش لە کاری نەشیاو، نیوەی ئیمانە.

**قۆناغی چوارەم**:پاک و پاراوکردنی لەش و پۆشەن و جلوبەرگە لە پیس و پوخڵی، تا هەموو لەش لە کاتی سوژدە و ڕکووعدا پاکژ بێ. ئەمەش ئاستی پاکی موسوڵمانییە، چونکە جیاوازی موسوڵمان و ناموسوڵمان لە پێوەندییاندا نوێژە، ئەم پاکیەش نیوەی ئیمانە.

بەم چەشنە ئاشکرا بوو لە هەموو قۆناغەکانی بڕوادا، پاکی نیوەی لە ئیمانە بە پێی ئەم پەیڤەش کە:«بُنِيَ الإِسْلامُ عَلَى النَّظَافَة»؛ بناغەی دینی لەسەر دانراوە. پاکی و پاراوی لەش و جلوبەرگ کە زۆربەی خەڵکی ڕوویان تێناوە، خوارترین قۆناغ لە پاکییە. بەڵام چونکە ساناترە و نەفسیش بەشی خۆی حەزی لێ دەبا و پێی ئارام دەگرێ و هەموو کەسیش دەیبینن و بە پارێزکاری دەزانن، لەم سۆنگەوە بۆ خەڵکی ساناترە. بەڵام پاکی و پاراوی دڵ لە ڕژدی و چرووکی و لووتبەرزی و فیز و دەمار و مەرایی و دونیادۆسی و پاکی لەش لە گوناح و تاوان، هیچ بەهرەیەک بە نەفس نادا و چاوی خەڵکیش پێی ناکەوێ، چونکە ڕوانگەی خوایە نەک خەڵک؛ بۆیە هەموو کەس خۆی لێ نادا.

## مەرجەکانی خۆپارازتن (احتیاط) کامن؟

ئەم پاراوییە هەرچەند بە ڕواڵەت ئاستی لە خوارە، لەڕاستیدا جێگای ڕێزە، بە مەرجێک کە نەبێتە هۆی وازوازی[2] بوون و زێدڕۆیی. ئەگەر گەیشتە ئاستی وازوازی بوون و زێدەڕۆیی، نالەبار و نەگونجاوە و ڕەنگە تووشی تاوان بێ. ئەم خۆپارێزییە کە خوو و خدەی سۆفییەکانە و بریتییە لە گۆڕەوی لە پێبوون، مێزەرە لەسەر بوون، دڵنیا بوون لە ئاوی پاک و ڕاگرتنی ئافتاوە تا کەس دەستی لێ نەدا، هەموو جوانن. ئەو مەلایانەی بەم چەشنە خۆ ناپارێزن، بۆیان نییە بەرهەڵستیان بن، مەگین بەمەرجێک. ئەم سۆفییانەش بۆیان نییە تەوس و توانج بگرنەئەو مەلایانەی خۆپارێزیان نییە. چونکە ئەو خۆپارێزییانە جوانن، بەڵام بە شەش مەرج:

**مەرجی یەکەم**: چونکە کاتی زۆر دەبا، نەبێتە هۆی پەککەوتنی کاری گرینگ و پڕبایەختر. ئەگەر کەسێک بۆی بلوێ بپەرژێتە سەر فێربوونی زانست، یاخۆ بە ڕامان و بیرکردنەوە، لە نهێنییەکان بگا، یا خۆ بۆ دابینی بژیوی ژن و منداڵی بپەرژێتە سەر کارێ تا دەستی گەدایی بۆ خەڵکی ڕانەکێشێ و

---

[1] - دۆخمان- خاین و بێئەمەگ، بێفەڕ.

[2] - وازوازی= سەرسەری.

بە دەرۆزەیی نان دەرنەهێنێ، بۆی نییە ئەگەر پارازتنی[1] پاکی پەکی ژیانی بخا، خۆی پێوە ماندوو بکا؛ چونکە ئەو کارانەی گەلێک گرینگترن لە پاراستنی پاکی. بەم بۆنە بوو کە ئەسحاب قەد بەم پاراستنە خۆیان ماندوو نەدەکرد، چونکە خەریکی کۆشەوە و هەوڵ بۆ ژیان و خەبات و فێربوونی زانست و کاری گرینگتر لە پاراستن بوون. بە پێخواس دەرۆیشتن، بەبێ بەرماڵ بۆ نوێژ دەوەستان، بەسەر خاکدا دادەنیشتن و کاتێ خەریکی خواردن بوون دەستیان بە ژێر پێیاندا دەکێشا و لە ئارەقی ئاژەڵ و ئەسپ و چارەوێ خۆیان نەدەپاراست؛ چونکە زۆرتر بۆ پاراوی دڵ تێدەکۆشان، نەک پاکی لەش. کەواتە، گەر کەسێک وابوو، سۆفی بۆیان نییە ڕخنەی لێبگرن و بەرهەڵستی بن. ئەوەش کە لە سۆنگەی سستی و تەمەڵییەوە پاکی ڕاناگرێ، ئەوەش بۆی نییە ڕەخنە لەو کەسانە بگرێ کە پاکی ڕادەگرن؛ بێگومان ڕاگرتنی پاکی چاکترە لە ڕانەگرتنی.

**مەرجی دووەم**: ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی لە چاوە[2] و دووڕوویی و مەرایی بپارێزێ. چونکە هەرکەس خەریکی ڕاگرتنی پاکی بوو، هەموو ئەندامی هاوار دەکەن کە: «خەڵکینە! من پیاوی خوام، بۆیە خۆم لە پیسی دەپارێزم». لەمەشدا مرۆڤ تووشی چاونەزێری و تەماح دەبێ و ئەگەر پێخواس پێی لە عەرز بکەوێ، یاخۆ لە دەفری کەسیتردا دەسنوێژ بشوا، زۆر دەترسێ لە چاوی خەڵکی بکەوێ. بۆئەم مەبەستەش، دەبێ لە پێش چاوی هەمووان پێ بەسەر خاکدا بنێ، تا ئیزنی ئەم کارە - پاراستن لە ناپاکی - وەربگرێ. هەروەها بە شراوە و بەرپیوار خۆی لە ناپاکی ببوێرێ. ئەگەر نەفس حەزی لێ بوو خەڵکی بەم کارەی بزانن، ئاشکرایە چاوە و خۆنواندن ڕووی تێناوە. ئێستا لەسەری پێویستە بۆ وەرگرتنی ئیزنی ئەو کارە، بە پێخاوس ڕێگا ببڕێ، لەسەر عەرزدا دانیشێ و لەسەر خاکدا نوێژ کا و لە پاراستنی پاکی دەست ڕاگرێ: چونکە چاوە و دووڕوویی حەرامە و پاراستن سوننەتە. کە لە حەرام دەرباز نەبێ، مەگین بە بەجێهێشتن و دەسهێشتنی پاراستن، لەسەری پێویستە خۆی لە پاراستن ببوێرێ.

**مەرجی سێهەم**: ئەوەیە کە جارجار لە پاراستن لابدا و بەسەر خۆیدا فەرزی نەکا. هەروەکوو چۆن پێغەمبەر لە دەفری موشریکێکدا دەسنوێژی شوشت، عومەر لە گۆزەی ژنە عیسایيەکدا تارەتی گرت. زۆربەی کاتان بەسەر خاکدا بۆ نوێژ دەوەستان. ئەگەر کەسێک لە نووستنا ڕایەخی خاک و سەرینی بەرد بوایە، لە لایان بەرێزتر بوو. کەواتە ئەگەر ڕەوتی ئەمانە لە بیر کا و بە ناڵەبار سەیری کا و نەفس لەسەر شێوەی ئەوان پشوودرێژی نەکا، هۆی ئەوەیە لەم کارە - ڕاگرتنی پاکی - نەفس تەماحێکی هەیە. زۆر گرینگ و پڕبایەخە دەس لەم کارەی ڕابگرێ.

---

١- پارازتنی= پاراستنی.

٢ - چاوە= دووڕوویی.

**مەرجی چوارەم:** هەر پاراستنێ کە هۆی ئازاری موسوڵمانێ بێ، دەبێ وازی لێ بێنێ. چونکە ئازاری دڵی خەڵکی حەرامە و دەسهێشتن لە پاراستن حەرام نییە. وەکوو ئەوەی ئەگەر کەسێک بۆ چاک و چۆنی دەسڕابکێشێ، کەچی ئەم بە هۆی ئەوەی دەسی ئەو کەسە ئارەقەی کردووە، دەس ڕانەکێشێ و خۆی لێ لابدا، ئەمە حەرامە، چونکە دڵی کەسێکیتر دەڕەنجێنێ. لەڕاستیدا ئاکاری بەرز و جوان و ڕووی خۆش و کراوە و شادکردنی دڵی موسوڵمان، لەم کاتەدا پتر لە هەزار جار پیرۆزتر و بەرزتر لە پاراستنە. هەروەها ئەگەر کەسێک پێی بە بەرماڵیدا نا، لە دەفری وی تارەتی گرت، یا خۆ لە گۆزەی ئەو ئاوی خواردەوە، نابێ زیز بێ و ڕووی خۆی گرژ کا. جارێک پێغەمبەری دلۆڤان، ئاوی زەمزەمی داوا کرد. عەبباس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: «خەڵکی زۆریان دەست لێداوە، ئاوەکەی ئاڵۆزاوە، دەفرێ دێنم بۆت هەڵدەکێشم». فەرمووی: «نە، پێز و بەرەکەتی دەستی موسوڵمانان لە لام پیرۆزترە». زۆر خوێنەری نەزان لە جوانی ئەم پەیڤە وردە ناگەن و خۆیان لەو کەسەی پاکی ڕاناگرێ، دەبوێرن. بەم کارەیان دەیڕەنجێنن، تەنانەت ڕەنگە لە دایک و باب و برا و دۆستیان زیز بن ئەگەر دەست بۆ جلوبەرگ و دەفری ئاویان بەرن؛ ئەمەش حەرامە. چۆن ڕەوایە بە بۆنەی پاراستنێکەوە کە فەرز نییە، دڵی خەڵکی بشکێنی کە دڵشکاندن حەرامە؟ ئەوانەی وا بەم چەشنە هەڵس و کەوت دەکەن، ئەو کەسانەن کە بای خۆبەزلزانینیان لەسەرایە و منەتیان بەسەر خەڵکایە کە ئێمە ئاوا دەکەین و هەردەم لە بۆسەدان[1] تاکوو خۆ لە خەڵکی ببوێرن و دڵی خەڵکی بشکێنن و خۆ بە گەورە بنوێنن و ئەو خەڵکەی، کە وەکوو یارانی پێغەمبەر ئاسانگیر بوون، ئاسانگیرن بە پیس و پوخڵ پیشان بدەن. هەروەها ئەگەر کەسێک لە ئاودەستا بە بەرد تارەت بگرێ، بە گوناحی گەورەی دەزانن. ئەمەش هەمووی لە سۆنگەی نزمی ئاکار و پیسی دەروونە. پاک و پاراوکردنی دڵ لە ناپاکی فەرز و پێویستە؛ چونکە ئەمانە هۆی فەوتانی دواڕۆژن، کەچی دەستڕاگرتن لە پاراستنی پاکی هۆی لەناوچوون و فەوتان نییە.

**مەرجی پێنجەم:** ئەوەیە کە لە بۆ خواردن و لەبەر کردن و ئاخافتن خۆ لە ناپاکی لابدا، چون ئەمانە گرینگترن. کە کاری گرینگتر خرایە پشت گوێ و ئاوڕی لێنەدرا، هۆی ئەوەیە یا بۆ خۆ نواندن و تەماح پاکی ڕادەگرێ، یا لەسەر خوو و عادەت. وەکوو ئەوەی کەسێک لە کاتێکی ئاساییدا، لەسەر برسیەتی خواردنێکی سپڵۆت بخوا، کەچی تا دەست و دەمی بە تەواوی نەشوا نوێژ نەکا و ئەمە نەزانێ کە هەرچی پیس و سپڵۆت بێ خواردنی حەرامە. کەواتە ئەگەر خواردنێک سپڵۆت بێ، لە کاتی ئاساییدا بۆچ دەیخوا؟ ئەگەریش سپڵۆت نییە، بۆچ دەس و دەمی دەشوا؟ کەوابوو بۆچی لە سەر

---

[1] - بۆسە- کەمین.

رایەخێکدا کەخەڵکی لە سەری دانیشتوون، نوێژ دەکات و خواردنێ کە لە ماڵـێکی نـەناسـدا لێنـراوە، دەخوا؟ دڕدۆنگی لە پاکی خواردندا گرینگترە. زۆربەی ئەم کەسانە لە ماڵی بازرگان و دەوڵـەمـەندانـدا خواردن دەخۆن و لە سەر رایەخیان نوێژ دەکەن، ئەمەش دیاردەی راستبێژی لە گفتیاندا نییە.

**مەرجی شەشم**: ئەوەیەخۆی لە رادەی قەدەغەکراو بپارێزێ، بە چەشنێک وازوازی بوون لە تـارەتـدا نابێ پتر لە سێجار بێ، کە جاری چوارەم قەدەغە کراوە؛ تا نەکوا تارەتکردنەکەی درێـژە بخایـەنـێ و موسوڵمانێ چاوەنواڕی بێ، یا ئاوی زۆر بڕژێنێ، یا نوێژی وە درەنگ کەوێ، یا بەرنـوێژ بـێ و خـەڵـکی چاوەڕوانی بن، یا بڕیاری بە موسوڵمانێ دابێ و کاری وەدرەنگ کەوێ، یـا خـۆ کـاتی کـار و کـەسـبی پەکی کەوێ و خێزانەکەی سەخڵەتیان بێ، پەک کەوتـنـی ئـەم کارانـە بـە هـۆی ڕاگـرتنی پاکییـەوە پاکانە ناکرێ. یا خۆ بەرماڵێک بەرفراوان راخا لە مزگەفتدا تا کەس توخنی نەکەوێ؛ لـەمـەشـدا سـێ شت نەهی لێکراوە: **یەکەم** ئەوەی زۆرتر لەوەی مافی هەیە لە مزگەوتدا جێی داگیرکردووە؛ **دووەم** لـە مزگەوت و نوێژی جەماعەتدا نابێ نێوان ئاوەها بـێ، واتـە مـەودا پتـر و زۆر بـێ. سـوننەت وایـە، نـوێژ خوێنان شان بە شانی یەک بین؛ **سێهەم** ئەوەیەکە لە موسوڵمانان خـۆ دەپـارێزێ، هـەر وەکـوو چـۆن کەسێک خۆی لە سەگ و شتی سپڵۆت دەپارێزێ؛ ئەمەش گەلێک ناحەزە. هەروەهـا زۆر خراپـەیتـر قورئان خوێنانی نەزان بەهۆی زێدەڕۆیی لە پاراستنی پاکی تووشی دەبن.

## جۆرەکانی خاوێنی و پاکی رواڵەت

هەروەکوو زانیت پاکی رواڵەت جیا لە پاکی دەروونە (پـاکی دەروون سـێجـۆرە: پـاکی ئـەنـدامانی لەش لە سووچ و تاوان، پاکی دڵ لە ئاکاری نزم و چرووک، پـاکی سـەر لـە هـەرچـی بێجگـە خوایـە) ئەمەش بزانە پاکی رواڵەت سێپاژە:

**پاژی یەکەم پاکی لە سپڵۆت**: هەرچی بێگیانە خوای دلۆڤان خولقاندوویە، هەمووی پاکـە؛ بێجگـە لـە خواردنەوەیەک مەستی بێنێ؛ ئەوەش کەم و زۆری پیسە. هەرچی گیاندارە هەمووی پاکە، بێجگـە لـە سەگ و بەراز. هەر گیاندارێک کە بێگیان کەوت، پیسە؛ مەگەر چـوار تـاقم: مـرۆڤ، ماسـی، کولـە و ئەوەی خوێنی لە دەماریدا نەگەڕێ وەکوو هەنـگ و مـێش و دووپـشک و کـرم. ئـەوەی لـە دەروونی گیاندارا گۆڕابێ و هەڵگەڕابێ هەمووی پیسە، مەگەر ئەوەی ماک و بنەمای گیاندار بێ، وەکـوو تۆمـاو[1]، هیلکەی مریشک و کرمی ئاوریشم. ئەوەش هەڵنەگەڕابێ و نەگۆڕابێ پـاک و پـاراوە: وەکـوو ئـارەقـەو رۆندک[2].

---

١- تۆماو= ئاوی شاوەت.

٢- رۆندک= فرمیسک.

هەرچی پیس بێ نوێژی پێ ناکرێ؛ مەگین پێنج جۆری کە بەهۆی دژوارییەوە، بەخشراوە:
**یەکەم** ئاسەواری خۆ پاک کردنەوە و تارەت بە سێ بەرد، بە مەرجێ ئەم سێ بەردە لە جێی خۆی نەبزووتبێ. **دووەم** قوڕی شارێ؛ هەرچەن پیسایی بەراشکاوی دیار بێ، بەڵام لەو رادەی کە نەکرێ خۆتی لێ لادەی، بەخشراوە؛ مەگین کەسێک کە لەو قوڕەدا بکەوێ یا چوارپێیەک جل و بەرگەکەی پیس بکا، کە بە دەگمەن شتی وابێ، ئەمە نەبەخشراوە و دەبێ بە تەواوی خۆی بشوا. **سێهەم** پیساییەک لە شەکال و زەنگاڵت[1] سەرتر بێ و نەکرێ خۆتی لێ بپارێزی؛ ئەمەش بەخشراوە و تەنیا پێڵاوەکەت بە سەر خاکدا بماڵە و ئینجا نوێژت بخوێنە. **چوارەم** خوێنی کێچ، چ کەم بێ و چ زۆر - بە جل و بەرگی تۆوە بێ یا خۆ بەرگی کەسێکی‌تر کە تۆ لەبەرت کردبێ - بەخشراوە، هەرچەند عارەقەشی پێوە بێ. **پێنجەم**، ئەو زەرداوەی کە لە وردەزیپکەوە دەردێ و پێستی هەموو کەس هەیەتی، هەروەها ئەو ئاوەڕوونەی لە زیپکەی وردەوە دەردێ، ئەگەر بە جل و بەرگەوە نووسا، لە نوێژت نابا. بەڵام دومەڵ و کوانی بەکیم و زووخ کە لە لەشدا بە دەگمەن هەیە، دەبێ بەجوانی خاوێن بکرێتەوە، بەڵام ئەگەر ئاسەواری لێ بەجێ ما، ئۆمێد هەیە، خودا بیبەخشێ. بەڵام ئەگەر کەسێک دەماری خۆی بڕیبوو، یا خۆ بە هەر هۆیەک شوێنێکی بریندار بوو، دەبێ بەجوانی بیشوا. ئەگەر ئاسەواری لێوە ما و شۆردنی برین مەترسی هەبوو، دەبێ نوێژەکانی بە قەزا بگێڕێتەوە و بۆ ئەم بابەتەهیچ بڕ و بیانوویەک پارە نەکا.

سەرنج- **ئاوەپاک و پیسەکان:** هەر شوێنێکی پیس و سپڵۆت- بێجگە لە سپڵۆتی سەگ- بە جارێک ئاوپێداکردن خاوێن دەبێتەوە؛ مەگین ئەوەی پیساییەکە لە سەریدا مابێتەوە. ئەو دەم دەبێ ئەوەندە بشۆردرێ تا پیسایی بە ئێجگاری لێی نەمێنێ. ئەگەر چاک شۆردرا، کەچی هێشتا بۆن و رەنگی پێوە مابوو، پاک و خاوێن بۆتەوە.
هەر ئاوێک پەروەردگار خولقاندوویە، هەم بۆ خۆی پاکە و هەمیش پاک دەکاتەوە؛ مەگین چوارئاو:
**یەکەم** ئاوێک کە تازە بە کارت هێناوە؛ ئەو ئاوە پاکە، بەڵام پاک ناکاتەوە. **دووەم** ئاوێک کە بۆ شۆردنی پیسایی بەکاربراوە، نە پاکە و نە پاکژ دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر رەنگ و بۆن و چێژی وەرنەگەڕابێ، پاکە، هەرچەندکەڵکی پاک کردنەوەی پێوە نییە. **سێهەم** ئەوەی کە کەمتر لە دووسەت‌وپەنجا مەن بێ، بە پێی مەزهەبی شافیعی ئەگەرچی رەنگ و بۆن و چێژی وەرنەگەڕابێ، بەڵام پیس و ناپاکە. ئەگەر پتر لە دووسەت‌وپەنجا مەن بێ، تا رەنگ و بۆنی نەگۆڕێ بە هۆی پیساییەکەوە کە تێی کەوتووە، پاکژ و خاوێنە. **چوارەم** ئەوەی کە چێژ و رەنگ و بۆنی وەرگەڕێ بە

---

[1]- شەکال و زەنگال- پێڵاوی لە موو چندراو.

هۆی شتێکی پاکەوە؛ وەکوو زافەران، سابوون، شۆرەک، ئارد و هتد؛ ئەمە پاکە، بەڵام پاککەرەوە نییە؛ ئەگەر ئەو شتەی کە تێکەوتووە کەم بێ، بە کاری پاک کردنەوەش دێ.

**پاژی دووەم تارەت کردن**: پەنج شت لە تارەتدایە کە دەبێ بزانرێ: شێوەی دەس‌بەئاو، خۆ پاک‌کردنەوە بە بەرد(استنجاء)، دەسنوێژ، غوسڵ، تەیەمموم.

**چۆنیەتی دەستبەئاو چوون**: ئەگەر لە شار بە دوور بێ، دەبێ دوور لە چاوی خەڵکی بێ، ئەگەر بکرێ لە پەنا دیوارێکدا بێ؛ بەرلە دانیشتن پاتۆڵ لە پێ نەکەنێ، رووی لە هەتاو و مانگ نەبێ، پشت و رووی لە قیبلە نەبێ، مەگەر دیوارێکی لە دەوردا بێ، بەڵام باشتر وایە قیبلە لە لای چەپ یا خۆ راستی بێ. لە شوێنێکدا خەڵک کۆوە دەبن دانەنیشێ. لە نێو گۆماودا پێسایی نەکا، لە ژێر داری بەرداردا دانەنیشێ؛ لە بەر بادا و بەسەر بەرد و عەرزی سەختا میز نەکا، تا پرشەی لە نوێژی نەبا؛ بە سەر پێوە نابێ میز کا، مەگین بە هۆی عوزرێکەوە؛ لە شوێنی دەسنوێژ شۆردنی خەڵکیدا میز نەکا؛ لە کاتی دانیشتندا خۆ بخا بە سەر پای چەپیدا؛ کاتێکیش لە ئاودەست هاتە دەرەوە، سەرەتا پای راستی دابنێ؛ هەر شتێک کە ناوی خوای لە سەرە، لەگەڵ خۆی نەیباتە ئاودەست؛ کاتی هاتنە دەرەوە بڵێ: «أَعُوذُ بِاللهِ منَ الرِّجْسِ النَّجِسِ الْخَبِيثِ الْمُخْبِثَ الشَّيْطانِ الرَّجِيم[1]». کاتێ هاتە دەرەوە بڵێ: «اَلْحَمْدُ للّهِ الَّذِی أَذْهَبَ عَنِّی مَایُوْذِینِی وَ أَبْقَی عَلَیّ مَا یَنْفَعُنِی[2]».

**چۆنیەتی خۆ پاک‌کردنەوە بە بەرد (استنجاء)**: دەبێ پێش لە ئاودەست، سێ بەرد لە لای خۆت دابنێ. کاتێ دەس‌ئاو دوایی هات، بە دەستی چەپ یەکیان راگرە و خۆتی پێ پاقژ کەوە. هەر بەم چەشنە سێ بەردەکە بۆ پاقژکردنەوەی خۆت بەکار بێنە. پاشان بەردێکی گەورەتر بگرە بە دەستی راستەوە و بە دەستی چەپ شەرمگات بگرە و بیهێنە بە بەردەکەدا. ئەگەر بەم کارە دڵت دامرکا، تەواوە؛ بەڵام باشتر ئەوەیە ئاو بە کار ببەی بۆ پاک کردنەوەی خۆت.

ئەگەر ویستت ئاو بەکار بێنی بۆ پاک کرنەوەی خۆت، لەو شوێنە هەستە و لە شوێنێکی‌تردا دانیشە، تا پرشەی ئاو لەنوێژت نەبا. بە دەستی راست ئاو بکە بە دەستی چەپتدا و خۆ بسڕەوە، تا ئەوەی دڵنیا بووی لە پاکی خۆت. کە لە پاکیت دڵنیا بووی بۆ خاوێن کردنەوەی زۆرتری خۆت، خۆت ئازار مەدە، چونکە ئەو شوێنە حوکمی سپلۆتی بە سەریدا نادرێ.

هەروەها پاش میز کردن، سێ‌جار شەرمگای بگووشێ و سێ هەنگاو بێتە پێشەوە و سێ‌جار بە ئانقەست بکۆکێ و زۆرتر لەمە خۆ ئازار نەدات و خۆ تووشی وازوازی نەکا. ئەگەر ئەم کارەی کرد و

---

١. پەنا دەبەم بە خوا لە پیس و پوخڵی شەیتانی لەحنەتی.

٢. سوپاس بۆ خودایەک کە ئەوەی هۆی ئازارم بوو لێمی دوور کردەوە و ئەوەش خێر و قازانجی بۆم بوو هێشتییەوە.

پاش ئەوەهەستی بە تەڕی کرد، نەختێ ئاو لە ژێر پاتۆڵەوە بدا بە سەر رانیدا تا بە خۆی بڵێ ئەوەتەڕی ئاوەکەیە. پێغەمبەری خودا (د.خ) ئەم کارەی بۆ تووش نەبوون بە وازوازی بوون فەرموو.

کاتێ لەوەش دەرباز بوو دەس بە سەر دیوار یا زەویدا بماڵێ و پاشان بیشوا، تا هیچ بۆنێکی نەمێنێ. لە کاتی خۆ پاک کردنەوەدا بڵێ : «اَللّهُمَّ طَهِّر قَلبی مِنُ النِّفاقِ وَ حَصِّنْ فَرْجی مِنَ الفَواحِش[1]».

**چۆنیەتی دەسنوێژ:** کاتێ لە خۆ پاک کردنەوە خەلاسی بوو، بپەرژێتەسەر مسواک کردن. سەرەتا لای راست بشوا لە سەرەوە، پاشان لای چەپ لە ژێرەوە، دواتر رووی‌دان بشوا لە ناوەوە. ئینجا زار و نێو دەم خاوێن کاتەوە. مسواک کردن لە لات زۆر گرینگ بێ، چونکە لە هەواڵدا هاتووە کە «نوێژێکی بە مسواک باشترە لە حەفتا نوێژی بێ‌مسواک». لە کاتی مسواک کردندا دەبێ بڵێی«رێگای یادی خوا پاکژ دەکەم».

هەرکات کە تارەتت کرد، دەسنوێژ بشۆ؛ چونکە پێغەمبەری خوا هەروای دەکرد؛ قەد بەبێ مسواک کردن دەسنوێژی نەدەگرت. ئەگەر دەسنوێژت نەگرت و هەستت کرد تامی دەمت گۆڕاوە -بە هۆی ئەوەی کە بە تینوێتی نوستووی، یا شتێکی بۆندارت خواردووە، دەبێ دانت بە مسواک بشۆی، مسواک کردن سوننەتە.

کە لەم کارانە بوویتەوە، لە بەرزییەکدا رۆنیشە و روو لە قیبلە کە و بڵێ: «بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ[2]». سێ جار هەر دوو دەس بشوا و بڵێ : «اَللّهُمَّ إنّی أسْئَلُکَ الیُمْنَ وَ البَرَکَةَ وَ أعُوذُ بِکَ مِنَّ الشُّوم وَ الْهَلَکَةَ[3]». یان نییەتی نوێژی موستەحەب بێنێ یاخۆ نوێژی قەرز، نییەتەکەرابگرێ تا کاتی شۆردنی روومەتی، پاشان سێ‌جار ئاو بدا بە زاریدا - مەگین ئەوەی بە رۆژوو بێ- و بڵێ: «اَللّهُمَّ أعِنّی عَلی ذِکْرِکَ وَ شُکْرِکَ وَ تلاوَۃِ کتابِکَ[4]». ئینجا سێ‌جار ئاو بە لووتیدا بدا و لووتی بسرێ و بڵێ: « اَللّهُمَّ أرِحنی رائحَةَ الجَنَّة وَ أنتَ عَنّی راضٍ[5]». پاشان سێ‌جار روومەت بشوا و بڵێ: « اَللّهُمَّ بَیِّضْ وَجْهی بِنورِکَ یَومَ تَبْیَضُّ وجوهُ أولیائکَ[6]». دەبێ ئەوەندە ئاو بە ردێنیدا

---

١. خوایا! دڵم لە مەرایی و دووڕوویی خاوێن کە و شەرمگام لە کاری خراپە بپارێزە.

٢. (قورئان ٢٣/٩٧و٩٨) بە ناوی خودای دەهندە و دلۆڤان. پەنا بە تۆ لە دنەدانی شەیتانان. هەر هانایش دەبەمە بەر تۆ؛ کە ئەوان دێن بە لامەوە. (هـ)

٣. خوایا! خێر و بێرم لە تۆ دەوێ و لە شێوان و فەوتان پەنا دەبەمە بەر تۆ.

٤. خوایا! یارمەتیم بدە، بەردەوام بم لە شوکرانەبژێری و خوێندنی کتێبت.

٥. خوایا! لێم رازی بە و لە بەرامەی بەهەشتم بەش دە!

٦. خوایا! رۆژی پەسڵان کە خۆشەویستەکانت رووسپی دەکەی، رووی منیش سپی کە!

بدا تا ئاو دەگاتە بنی، بەڵام ئەوانەی ریشیان زۆرە و پیسە، قامک بخەنە نێو ریشیانەوە تا بە جوانی خاوێن بێتەوە. ئەم کارە پێی دەڵێن «تخليل»؛ بەشی بەرینی سەر کە لە پێش گوێوە تا ژووری جەمینە، پێی دەڵێن روومەت. بە قامک، سیلەی چاوی بسڕێتەوە تا ئەوەی لە گۆشەی چاویدایە - لە شوێنەواری کلە و شتیتر- پاک بێتەوە. پاشان سێجار باسک و مەچەکی تا نیوەڕاستی ئانیشکی بشوا؛ هەرچەند نزیک بە بازووی بێتەوە باشترە. پاشان بڵێ: «اَللّهُمَّ أعْطِني کِتابي بِیَمِیْنِي وَ حاسِبْني حِساباً یَسِیراً[1]». دەستی چەپیشی هەر بەم چەشنە. پاشان پەنجەکانی راشەکێنێ تا ئاوی لێ داچۆڕێ و بڵێ: «اَللّهُمَّ إنّي أعُوذُ بِکَ اَنْ تُعطِیَني کِتابي بِشِمالي اَوْ مِنْ وَراء ظَهْري[2]». ئینجا هەر دوو دەستی تەڕ کا، سەری پەنجەکانی پێکدا بدا، دەستی هەر لە پێش سەرەوە تاکوو پشت سەری بە قژیدا بێنێ و هەر بەو شوێنەدا بیهێنێتەوە، تا بەر و پشتی قژی تەڕ بێ - ئەمە یەکجارە و سێجار دەبێ هەر وا بکا تا سەری بە تەواوی مەسح دەکا و ئینجا بڵێ: «اَللّهُمَّ غَشِّني بِرَحْمَتِکَ وَ أنزِلَ عَلي مِن بَرَکاتِکَ وَ أظِلَّني تَحتَ عَرشِکَ یَومَ لاظِلَّ الاّ ظِلَّکَ[3]». سێجار بە دەستی تەڕ، گوێکانی مەسح کا و قامک بە کونی گوێیدا کا و دەست بە پشتی گوێیدا بێنێ و بڵێ: «اَللّهُمَّ اجْعَلني مِنَ الّذینَ یَستَمِعون القَول فَیَتَّبِعُونَ الاَحسَنَه[4]». دەستی بە ملیدا بساوێ و بڵێن: «اَللّهُمَّ فُکَّ رَقَبَتي مِنَ النّارِ وَ أعُوذُ بِکَ مِن السّلاسِلَ وَ الأغلال[5]». پاشان تا نیوەی پووز، قاچی بشوا و بە قامکە چووکەی دەستی، نێوان قامکەکانی پێی خاوێن کاتەوە؛ لە قامکە چووکەوە تا قامکە گەورەی خاوێنی کاتەوە و بڵێ: «اَللّهُمَّ ثَبِّتْ قَدَمي عَلَی الصِّراطِ یَوْمَ تَزِلُّ مِنهُ الاقدام[6]». پاشان پای چەپی بشوا و بڵێ: «أعُوذُ بِکَ أنْ تَزِلَّ قَدَمي عَلَی الصِّراطِ یَوْمَ تَزِلُّ اَقْدامُ الْمُنافِقین[7]». کە لەم کارەی بووەوە بڵێ: «اَشهَدُ اَنْ لا الهَ الاّ الله وَحْدَهُ لا شَریکَ لَهُ وَ اَشْهَدُ اَنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَ رَسُولُه. اَللّهُمَّ اَجْعَلني مِنَ التَّوّابینَ وَ جْعَلني مِنَ المُتطَهِّرینَ وَ جعَلني مِن عِبادِکَ الصّالحین[8]».

ئەوەی عارەبی نازانێ، دەبێ لە واتای ئەم گازندانە بگا، تا بزانێ چ دەڵێ. لە هەواڵدا هاتووە، ئەوەی

---

٢. خوایا! نامەی کردەوەکانم بدە بە دەستی راستمەوە و ئاسان بە حیسابم رابگە.

٣. خوایا! پەنا دەبەمە بەر خۆت لەوەی کە نامەی کردەوەکانم بدەیتە دەستی چەپم، یا خۆ لە پشت سەرەوە بیدەیتە دەستم.

٤. خوایا! بەرگی بەزەییتم لەبەر کە و لە خێر و پیتم بێبەش مەکەو لەو رۆژەش کە بێجگە لە سێوەرت، سێبەریتر نییە، لە ژێر سێبەری خۆتم راگرە.

٥. خوایا! لە ریزی ئەوانەی دامنە کە گوێ بۆ قسان شل دەکەن و باشترینی هەڵدەبژێرن.

٦. خوایا! لە ئاورم بپارێزە و لە کۆت و زنجیرم دوور کە.

٧. خوایا! هەنگاوەکانم لە سەر پردی سیراتدا قایم راگرە، لەو دەمەیدا کە هەنگاوەکان دەلەرزن.

٧ - خوایا! هانات پێ دەبەم لەوەی کە هەنگاوەکانم بە سەر پردی سیراتدا بلەرزن، ئەو رۆژەی کە هەنگاوی دووڕووەکان دەلەرزێن.

٨ - شایەتی دەدەم کە بێجگە لە ئەڵلا خوایەک نییە و تاکەو بێئامبازە و شایەتی دەدەم کە محەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە. خوایا! بمانخە ریزی پاشگەزبووان لە گوناح و ئەو کەسانەی بە پاکی دەژین و بەندەی چاکی تۆن.

لە کاتی تارەت و دەسنوێژ، یادی خودای دلۆڤان دەکا، هەمـوو ئـەنـدامانی لـەو گونـاح و تاوانانـەی تووشیان بووە، پاکژ دەبن. بەلام ئەگەر یادی خوا نەکا، تەنیـا ئـەو پاژانـەی ئاویـان لـێ کـەوتـووە پـاقژ دەبن.

پێویستە بۆ هەر نوێژێک، دەسنوێژی تازە بشوا، هەرچەن دەسنوێژی نەشکابێ، چونکـە لـە هـەوالـدا هاتووە کە: «هەرکەس دەسنوێژ تازە کاتەوە، پەروەردگار، بڕوای تازە دەکاتەوە». کە دەسنوێژی دوایـی هێنا، دەبێ بزانێ ئەوەی پاکی کردۆتەوە جێگای سەیری خەلکە، نەک خوا؛ جێگای سەیری خـوا دلـە؛ کە دڵ بە پاشگەز بوونەوە لە ئاکاری نزم و چرووک خاوێن نەکاتەوە، وەکوو ئەو کەسەیە کـە پادشـا بـە میوانی بێنێتە مالی خۆی؛ بەردەرکەی ماڵ پاک و جوان بشوا، کەچی دیواخـان و ژووری میـوان -کـە نیشتنگای پادشایە- بە پیسی بێلێتەوە.

**سەرنج:** بزانە لە دەسنوێژدا، شەش شت ناپەسـەنـدە: ئاخـافتن، دەس بـەروودا دان، دەسـتی تـەڕ راتلەکاندن، دەسنوێژ گرتن بە ئاوێک کە بە هەتاو گەرم کرابێ و ئاوی زۆر ڕژاندن، زۆرتر لە سێجار.

بەلام هیشک کردنەوەی دەسـت و روو بـەو مـەبـەسـتەی کـە تـۆزی لـە سـەر نـەنیـشێ، یـا خـۆ دەسهێشتنی تا شۆنەواری عیبادەت زۆرتر بمێنێ، هەردووی بێژراوە و ئەگەر مەبەست هەر ئەوەی بـێ کە بێژرا، ئیزنی دراوە و هەردووکیان چاکن.

لە هەنبانەی گلی بۆ تارەت و دەسنوێژ کەلک وەرگرتن چاکترە و لە دەماربەرزی دوورترە تـا ئافتـاوە و دەفری کانزایی.

**چۆنیەتی غوسل و لەشپیسی دەرکردن:** ژن یا پیاوێک کە لەگەل ژن یا پیاویتردا جووت بـێ، یـا خۆ ئاوی شاوەتی لێ جوێ بێتەوە- چ لە خەودا بێ یان بەخەوەر- غوسلی لە سەر پێویستە. پێویـستە هەموو لەشی بشوا و ئاو بگاتە بنجی مووی لەشی و نییەتی دەرکردنی لەشپیسی بێنێ.

بەلام سوننەت وایە، سەرەتا بلێ بەناوی خوا، سێجار هەر دوو دەستی بشوا، هەرجێگایەکی لـەشـی پیس بووە جوان بیشوا، پاشان بەو جۆرەی پێشتر بێژرا، دەسنوێژ بشوا(شۆردنی پای بهێلێتەوە بـۆ پـاش غوسل)؛ سێجار ئاو بە لای راستیدا کات، سێجار بە لای چەپیدا و سـێجـاریش بـە سـەریـدا. هـەر شوێن کە دەستی پێ رادەگا بیهەنوێ. ئەو شوێنانەی لۆچن، هان بدا ئاوی پێدا بکا، چونکە ئەمـە فـەرز و پێویستە. لەم کاتەدا دەس لە شەرمگایان نەدەن.

**چۆنیەتی تێمۆم:** ئەگەر کەسێک ئاوی نەبینییەوە، یا خۆ زۆرتـر لـە بـەشـی خواردنـەوەی خـۆی و هاوڕێیانی دەستی نەکەوت، یا خۆ لە سەر رێگای ئاودا دڕندەیەک یا زەلامێکـی دڕنـدە و شـەڕکـار لـە بۆسەدا بوو، ، یا ئەوەی ئەو ئاوە مالی کەسێکە پێی نایفرۆشێ مەگین بە پارەیەکی ئێجگـار زۆر، یـا خـۆ برینێکی هەیە کە ئاو دەیخاتە گیانەلاوە یا خۆ تەشەنەی پێ دەکا و چاک بوونەوەی دەخاتـە درەنگـان،

دەبێ دان بە خۆدا بگرێ تا کاتی نوێژان رادەگا. خاکێکی پاک بدۆزێتەوە؛ هەر دوو لەپی پێیدا بدا تا تۆزی هەستێ، قامکەکانی بکاتەوە و نییەتی ئیزنی نوێژ بێنێ و هەموو روومەتی بە ناو لەپی بمالێ، زۆر هان نەدا تا تۆز بگاتە بنجی مووی روومەتی؛ پاشان ئەنگوستوانەکەی دەربێنێ و جارێکی‌تر دەست بەسەر خاکەکەدا بکوتێ. پەنجەکانی لێک‌کاتەوە و ناو لەپی چەپی بە سەر پشتی قۆڵی راستیدا بمالێ، پاشان قامکە گەورەی چەپی بە سەر قامکە گەورەی راستیدا بساوێ؛ دەستی راست هەر بەم چەشنە بە سەر دەستی چەپدا بمالێ، پاشان هەر دوو دەستی پێکدا بێنێ و پەنجەکانی هەڵپێکێ و بە یەکتردا بمالێ. ئەمانە هەمووی یەکجار دەس بە خاکدا کوتانی بۆ بەستە، پێویست ناکا تۆز بە هەموو دەست و روومەتیدا بگا. ئەمەی بێژرا بۆ یەکجار فەرزی نوێژ بەجێهێنانە و بۆ جاری‌تر، دەبێ دیسان تێمۆم کا.

**پاژی سێهەم: پاکژ کردنەوە لە پیسایییەکانی لەش**- ئەمەش دووجۆرە:

**جۆری یەکەم**: پیس و پوخلی، وەکوو چڵکی نێو تووکی سەر و ریش. ئەمەش بە شانەو ئاو و گڵ[1] دەبێ خاوێن بکرێتەوە - پێغەمبەری خودا چ لە ماڵ و چ لە دەر، قەد بە بێ‌شانە نەدەبوو. سڕین و خاوێن کردنەوەی ئەو چڵکانە سوننەتە. ئەویتر، پاک کردنەوەی سیلەی چاوە لە کاتی دەسنوێژ شۆردن لە کلە و ئەو شتانەی تێدا کۆوە بووگن. سێیەم ئەوەی لە گوێدا بێ، پێویستە کە لە حەمام هاتە دەرێ، خاوێنی کاتەوە. چوارەم پاک کردنەوەی لووت و ددان. ئەمەش بە مسواک و غەرغەرە و لووش کردنە. هەروەها ئەو چڵکانەی کە لە پاژنە و ژێر نینۆکان و بە گشتی بە سەر هەموو لەشدا کۆوە دەبن، سڕینی ئەمانە هەمووی سوونەتە.

ئەوەش بزانە ئەگەر چڵکت لە شوێنێکی لەشدا هەبێ، ئەوە تارەت پووچەڵ ناکا؛ چونکە نابێتە کۆسپێک لە نێوان ئاو و پێستدا؛ مەگین ئەوەی ئێجگار زۆر بێ لە ژێر نینۆکدا(ئەوەش دوورە) و ئینجا ببێتە لەمپەری پێست و ئاو. پاکژ بوونەوە لەم چڵکانە بە هۆی ئاو و گڵەوە سونەتە.

سەرنج: **ئەریتی حەمام**. هەرکەس بڕواتە نێو حەمامەوە چوار شت و دە سوننەتی لەسەر فەرزە: دەبێ ئاگای لە دوو شتی شەرمگای خۆی بێ: **یەکەم** لە سەر ناوکەو تاکوو سەر ئەژنۆی شاراوە بێ، **دووەم** نەهێڵی ناتر[2] دەستی لێ بکەوێ، دەست هەنوون لە دیتن خراپترە. بە گوێرەی شەرمگای خەڵکی‌تر دەبێ ئاگای لە دووشت بێ: **یەکەم** چاوی خۆی رابگرێ، **دووەم** ئەگەر کەسێک شەرمگای دیار بوو، دەبێ پێی بڵێ خۆی داپۆشێ و چاوی خۆشی رابگرێ؛ ئەگەر وانەکا، گوناحبار بووە و بە

---

١. گل= خاکێ کە پێشوونان سەریان پێ شۆردووە.

١. ناتر: کیسەکێشی حەمام.

گوناحبارییەوە لە گەرماو هاتۆتەدەر. ئەڵێن رۆژێک ئیبنی عومەر لە حەمام دانیشتبوو، رووی لـە دیـوار بوو و شتێکی بە سەر چاودا بەستبوو.

ژنان هەر ئەمەیان بۆ بەستە.

خواردنی نان لە گەرماودا نەهی کراوە، مەگین بە هۆی عوزرێکەوە.

بەڵام **سوننەتەکان**: سەرەتا دەبێ نییەت بێنێ و بڵێ سوننەت بەجێ دێنم تا لە کـاتی نـوێژدا رازاوە بم لە دەرگانەی پەروەردگار، نە بەبۆنەی خەڵکییەوە. سەرەتا پارەی دەللاک[1] بدا، تـا دڵـخۆش بـێ لـە کاتی ئاو پێداکردنیا و بزانێ چی پێ ئەدرێ. کاتێ دەرواتە ناوەوە پای چـەپ لـەبـەردا دابنـێ و بـڵێ: «بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ. اَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الرِجْسِ النَّجِسِ الْخَبيثِ الْمُخْبِثِ الشَّيْطانِ الرَّجيمِ» چونکە گەرمـاو جێـی شەیتانە[2]. هان بدا گەرماوی بۆ خالی کەن یـا خـۆ کاتـێ بـروا کـە چـۆڵ بـێ. خێـرا نـەرواتـە ژووری گەرمەوە تا ئارەقەی زۆرتر کا؛ کاتێ رۆیشت، دەس بە جێ هەردوو دەستی بشوا. بەزۆری ئاو نـەرژێنـێ، بە رادەیەک ئاو بە خۆدا بکا کە گەر خاوەن گەرماو بینی، لێی زوێر نەبێ. کاتی رۆیشتنە گەرمـاو نابـێ سلاو کەن؛ بەلام دەست‌کوشین قەیدی نییە؛ کەچی ئەگەر کەسـێک سـلاوی کـرد لـە وەرامـدا پێـی بڵێ: «عافاك الله» و قسەی زۆر نەکا. ئەگەر قورئان دەخوێنێ، بە ئەسپایی بیخوێنێ و بانـگ هـەڵـنەدا؛ بە دەنگی بەرز دەتوانێ لە شەیتان هانا بباتە بەر خودا. کاتی نوێژی شێوان و ئـاوا بـوونی خـۆر، نێـوان نوێژی شێوان و خەوتن نەرواتە گەرماو؛ چونکە ئەم کاتە، کاتی بلاوە بوونی شەیتانـە. کـە رۆیـشتە نێـو ژووری گەرمەوە، یادی ئاوری دۆژەبکا، مـاوەیـەک تێیـدا رابمێنـێ تـا بزانـێ زینـدانی دۆزەخ چۆنـە؛ هەرچەند ژیر و لێزان ئەو کەسەیە کە لە هەموو شتدا بیری رۆژی پەسلانی پـێ بـێ: ئـەگـەر تـاریکی بینی، تاریکی قەبری لە یاد بێ، ئەگەر مـارێکی دی، ئـەژدیهاکـانی دۆزەخـی بکـەوێتـە یـاد؛ ئـەگـەر روومەتێکی گرژ و ناحەزی دی، بکەوێتە بیر نەکیر و مونکر و گزیری دۆژەە؛ ئـەگـەر دەنگێکـی گـرانی بیست، بیر لە دەنگی کەڵەشاخ (نفحه صور) کاتەوە، ئەگەر کارێکی لێ وەرگـیرا یـا وەرنـەگـیرا، یـادی وەرگیران و وەرنەگیرانی رۆژی پەسلان کاتەوە. ئەمانەی بێژران، سوننەتەکانی شەرع بوون.

**جۆری دووهەم**ـ پاکییە لە شتە زێدەکانی لەش؛ ئەوەش حەوت جۆرە:

**یەکەم**ـ پرچ و قژ: لابردنی باشترە و لە پاکی نزیکترە؛ بێجگە لە «ئەهلی شـەرەف[3]». بـەلام ئـەوەی

---

[1]. دەللاک: کیسەکێشی حەمام.

[2] – لە نێو نووسراوەکۆنەکانی سەدەکانی رابردوودا پیس‌و پۆخڵییان بە شەیتان ناوبردووە؛ بۆ وێنە گوتوویانە شەیتانی ژێرنینـۆک، واتـە هەمان چڵکی ژێرنینۆک. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پیسـاییان بە هۆی ناخۆشی زانیوە و هەرچی هـۆی ناخۆشـی و کێـشە و گرفت بێ لە دونیا، بە سەربازی شەیتان زانراوە.

[3]. مەبەست «شەریفان»ە کە خۆ بە نەتەوە و منداڵانی پێغەمبەری ئیسـلام دەزانن و دروشمیان پرچی درێژە.

کە لایەک لە مووی سەر لابەیت و لایەکی بمێنێیەوە(وەکوو سەربازان) دزێو و نالەبار و نەهی لێ‌کراوە.

**دووەم**ـ سمێڵ دانان سوننەتە و نەهی لە تاشینی کراوە.

**سێهەم**ـ تووکی ژێربال، چل ڕۆژ جارێک هەڵکێشانی سوننەتە. ئەگەر لە سەرەتاوە خووی پێ گیرابێ، ئاسانە، ئەگەر خووی پێ نەگیرابێ دژوار و گرانە و تاشینی باشترە تا خۆ ئازار دان.

**چوارم**ـ تووکی شەرمگایە و لابردنی بە قسڵ[2] یا تاشینی سوننەتە، نابێ لە چل ڕۆژ پتر بێ.

**پێنجم**ـ گرتنی نینۆکە، تا چڵک لە ژێریدا کۆوە نەبێ. هەرچەند ئەگەر چڵکی لە ژێردا کۆوە بێ، دەسنوێژ پووچەڵ نابێتەوە، هەر وەک پێغەمبەری خوا(دروودی لێ بێ) ئەو چڵکەی بینی لە ژێر نینۆکی تاقمێکدا، فەرمووی کورتی کەنەوە، بەڵام نەیفەرموو نوێژەکەتان بکەنەوە. لە هەواڵدا هاتووە کە نینۆک کە درێژ دەبێتەوە، شەیتان لە ژێریدا نیشتەجێ دەبێ. سەرەتا دەبێ لەو قامکەوە دەست پێ‌بکرێ کە لە پێشترە و دەستیش لە پێ سەرترە و راستیش لە چەپ، قامکی شادە لە هەمووان لە پێشترە، سەرەتا ئەو. پاشان ئەوانەی لە لای راستی وین تا دەگاتە قامکی تووتە؛ پەنجەکان لە هەمبەر یەک دابنێ، پاش قامکە تووتەی دەستی راست، قامکە تووتەی دەستی چەپ تا دەگاتەوە قامکەگەورەی دەستی راست.

**شەشم**ـ ناوک بڕینە لە کاتی بەدونیا هاتندا.

**حەوتم**ـ خەتەنەی ژن و مێرد.

**سەرنج- نەریتی ردێن**: کەسێک پێی خۆش بێ دەتوانێ بە قەدەر مستێک ردێنی درێژ کاتەوە و زۆرتر لەوە دەبێ کورت بکرێتەوە، تا لە رادەبەدەر نەبێ. ئیبنی عومەر و تاقمێک لە تابعیین وایان دەکرد. تاقمێ گوتوویانە دەتوانن ردێنی درێژتر بهێڵنەوە.

بزانە لە ریش و ردێندا دەشت دزێو و ناحەزە:

**یەکەم**ـ خەنە و وسمە و رەنگی رەش؛ لە هەواڵدا هاتووە کە ئەم رەنگە رەشانە، خەنەی خەڵکی دۆزەخ و خەنەی کافرانە. یەکەم کەسێک کە وسمەی داوە، فیرعەون بووە. ئیبنی عەبباس دەڵێ پێغەمبەر خودا (د.خ) فەرمووی: لە ئاخر زەماندا تاقمێک دێن کە بە رەنگی رەش، ردێنیان رەش دەکەن؛ ئەمانە قەد بۆنی بەهەشت هەڵنامژن. لە هەواڵیشدا هاتووە کە دزێوترینی پیران ئەوانەن کە خۆیان وەکوو گەنجان لێ دەکەن؛ باشترینی گەنجانیش ئەوانەن کە خۆیان وەکوو پیران لێ دەکەن. بۆیە نەهی لێ‌کراوە چونکە ئەمە فێڵێکە بۆ نیازێکی ناپاک.

**دووەم**ـ خەنە و وسمە و رەنگی سوور و زەرد؛ بەم چەشنە رەنگ‌کردنی سەر و ردێن بۆ شەڕکەران

---

۲. قسڵ: ئاهەک.

لە ڕێگای خوادا سوننەتە تا کافران سامیان لێ ببەنەوە و بە سەریاندا زاڵ نەبن و بە سووکی سەیران نەکەن[1]. هەر بەم بۆنەوە تاقمێک لە موسوڵمانان ڕەنگی ڕەشیان بە کار هێناوە. بەڵام ئەگەر مەبەست ئەمەی بێژرا نەبێ، گزیکارییە و ئیزنی نییە.

**سێهەم-** سپی‌کردنی ردێن بۆ ئەوەی پیر دیار بێ و ڕێزی لێ بگیرێ. ئەم کارە بەڵگەی گەوجییە، چونکە ڕێز و حورمەت بە بۆنەی زانست و ئاوەزە نەک پیری و گەنجی.

**چوارەم-** ئەوەی مووی سپی لە ردێنی لا دەبا و رقی لە پیری بێ؛ وەکوو ئەوەیە لە ڕووناکییەک کە خوای دلۆڤان بەشی داوە، بێزی بێ؛ هۆی ئەمەش نەزانییە.

**پێنجەم-** هەڵکێشانی ردێن لە سەردەمی لاوێتیدا و بە بۆنەی حەز و ئارەزووی نەفسەوە، تا ڕوومەتی بێ‌تووک بێ؛ هۆی ئەم کارەش نەزانییە، چونکە بەردەوام فریشتەکان یادی خودا دەکەن و دەڵێن: «سُبْحانَ مَن زَیَّنَ الرِّجالَ باللُّحی وَ النِّساءَ بِالذّوائب»؛ واتە، پاکە خودایەک کە پیاوی بە ردێن و ژنانی بە کەزی ڕازاندووە.

**شەشەم-** لوول‌کردنی ردێن- وەکوو کلکی کۆتر- تا لە چاوی ژناندا بەدوتر بنوێنێ و حەزیان لێ بێ.

**حەوتەم-** ئەوەیە کە پرچی بەسەر ردێنیدا شۆڕ بکا و لە بناگوێوە بەرەو خوار بەری بداتەوە، زۆرتر لەوەی کە چاکان پرچ دێڵنەوە.

**هەشتەم-** ئەوەیە کە بە فیز و دەمارەوە سەیری پرچ و ردێنی ڕەش یا سپی خۆی کا؛ چونکە پەروەردگار ئەوەی بە فیزەوە سەیری خۆی بکا، خۆش ناوێ.

**نۆهەم-** ئەوەیە کە لە بەر خەڵکی ردێنی شانە کا، نەک لە بەر بەجێ‌هێنانی سوننەت.

**دەهەم-** ئەوەی ردێن بە ئاڵۆزی و شێواوی بێڵێتەوە تا خەڵکی پێیان وابێ پیاوی خوایە و لە بەر خوا ناپەرژێتە سەر شانەکردنی ردێنی.

تا ئێرە بێژرا بەسە بۆ پاک و پاراوکردنی لەش.

---

[1] ۱. دیارە ئەم سوننەتە لە ڕۆژگارێکدا بووە کە تاقمی موسوڵمان زۆرتر لە پیر و بەساڵاچووان پێک هاتووە؛ بەم بۆنەوە پێغەمبەر(ص) سەر و ردێنی ڕەنگ کردووە تا دوژمنان پێیان وا نەبێ لەشکری موسوڵمانان پیر و لەکار کەوتە و بێ‌دەسەڵاتن. بۆیە دەبینن لە سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عەلی‌دا، ئەم سوننەتە بەهۆی زۆر بوونەوەی لەشکری موسوڵمانان، وەلاوە دەنرێ.(ف.ئا)

## بنەمای چوارەم- نوێژ

بزانە نوێژ ئەستوونی موسوڵمانی و بناغەی دین و پێشڕەو و گەورەی عیبادەتەکانە. ئەوەی ئەم پێنج فەرزە بە پێی مەرجەکانی نوێژ بەجێ بێنێ، لەگەڵ پەروەردگاری پەیمانێک دەبەستێ کە بەردەوام لە ژێر چەتری چاودێری ئەودا بێ. کە خۆی لە گوناحە گەورەکان پاراست، ئەم پێنج فەرزە، هەموو تاوانەکانی‌تری دەشۆن. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەم نوێژە وەکوو جۆگە ئاوێکی پاک و پاراوە کە بە بەر دەرگەکەتاندا تێپەڕی و ئێوەش ڕۆژێ پێنج جار خۆتانی پێ بشۆن؛ جا قەد چڵک و پیسی بە لەشتاندا دەمێنێتەوە؟» گوتیان: «نە، ئەی پێغەمبەری خوا!» فەرمووی: «ئەم پێنج فەرزە وەکوو ئاوی ڕووناک گوناحەکانتان دەشوا».

پێغەمبەر فەرمووی: «نوێژ ئەستوونی دینە؛ ئەوەی ئاگای لێ‌بڕا، دینی خۆی کاول کرد». لێیان پرسی: «چ‌کارێک لە هەموو کارەکان سەرترە؟» گوتی: «بەجێ‌هێنانی نوێژ لە کاتی خۆیدا». فەرمووی: «کلیلی بەهەشت نوێژە». هەروەها گوتی: «خوای مەزن، پاش تاک‌پەرستی، هیچ شتەکی فەرز نەکرد کە لە نوێژی خۆشتر بوێ؛ کە ئەگەر شتێکی زۆرتر لە نوێژ خۆش بویستایە، فریشتەکانی دەپەرژاندەسەر ئەو کارە؛ چونکە بەردەوام خەریکی نوێژن؛ تاقمێک لە ڕکووع، تاقمێ لە سوجدە و تاقمێ ڕاوەستاو، تاقمێ دانیشتوو». فەرمووی: «هەرکەس بە قەستی تاقەنوێژێک بفەوتێنێ، کافر دەبێ»؛ واتە مەبەستی ئەوەیە نزیک بۆتەوە لەوەی کە بناغەی بڕوای بێتە لەرزین؛ هەر وەکوو چۆن دەڵێن: ئەوەی لە بیابان ئاوی فەوتا، خۆشی فەوتا، مەبەست ئەوەیە نزیک بۆتەوە لە فەوتان و لەناو چوون و تووشی مەترسی بووە. هەروەها فەرموویە:«یەکەم شتێک لە ڕۆژی پەسڵاندا سەرنجی پێ‌دەدرێ، نوێژە؛ ئەگەر تەواو و بێ‌کەم و کورتی بێ، دەیپەزێرن و کردەوەکانی‌تر بە دوای ئەودا لێک دەدرێنەوە و پێی ڕادەگەن؛ کەچی ئەگەر کەل و کوتەر بێ، لەگەڵ کردەکانی‌تریدا بە سەریدا دەدەنەوە».

پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی بە جوانی تارەت بگرێ و لە کاتی خۆی نوێژ بخوێنێ و ڕکووع و

سوجدەی بەدەو بێ و بە دڵ ملکەچ و خاکەسار بێ، نوێژەکەی تا بە تەختی مەزن، سپی و رووناک دەڕوا و هەردەم دەڵێ[1]: "خوای مەزن بتپارێزێ، هەر بەو چەشنەی منت پاراست"؛ بەلام ئەوەی نوێژ لە کاتی خۆیدا نەخوێنێ، بە پاکی تارەت نەهێنێ، رکووع و سجوودی بەدەو نەبێ و بە تەواوی ملکەچ و خاکەسار نەبێ، ئەو نوێژە بە رەشی و تاریکی دەڕوا تا بە تەختی پەروەردگار و هەردەم دەڵێ: "خودا بتفەوتێنێ بەو چەشنەی منت فەوتاند"، تا ئەو دەم کە پەروەردگاری مەزن بڵێ نوێژەکەی وەکوو پەڕوە کۆنە بدەنەوە سەریا». هەروەها فەرمووی: «خرابترین دز، ئەوەیە لە نوێژ بدزێتەوە».

## چونیەتی رواڵەتی نوێژ

بزانە کە رواڵەتی نوێژ وەکوو جەستەیە؛ راستی و نهێنیەکەشی هەیە کە پێی دەڵێن رووحی نوێژ. سەرەتا رواڵەتی نوێژ راڤە دەکەین.

سەرەتا، پاش ئەوەی کە لە تارەت و پاکژکردنی لەش و بەرگی بووەوە و خۆی داپۆشی، لە شوێنێکی پاک و خاوێن روو بە قیبلە رابوەستێ. نێوان هەنگاوەکانی بە قەدەر چوار ئەنگوست لێک جیا بن؛ پشتی راست و سەر نەوی کا و چاو لە سوجدەگای سەرتر نەبێ.

کە قنج وەستا، «قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ النَّاس[2]» بخوێنێ، بەو بیرەوە کە شەیتانی لێ دوور کەوێ.

**بانگ و ئیقامەو نییەت**: ئەو دەم ئەگەر کەسێک دایەپەی و پێڕەوی کرد، بە دەنگی بەرز و خۆش بانگ بدا، ئەگەر نە، بەکورتی و بە نزمی بیڵێ. لە دڵدا نییەت بێنێ و بە دڵ بڵێ: «بە جێی دێنم فەرزی نوێژی بەیانی(بۆ نموونە) بۆ خوای گەورە و مەزن».

**تەکبیر**: کە واتای ئەم پەیمانەی لە دڵدا گوت، دەست هەڵبڕێ تا نزیکی گوێ، بەجۆرێک کە سەری قامکەکانی لە هەمبەر گوێدا بن و سەری قامکی گەورەلە بەرانبەر نەرمێنەی گوێدا بێ. کە وای کرد بڵێ: «الله اکبر»، پاشان هەر دوو دەستی لە سەر ناوکی دابنێ و دەستی راست لە سەر دەستی چەپ بێ و قامکی شادە و زەڕنەقووی دەستی راست لە سەر مەچکی دەستی چەپ دانێ و قامکەکانیتری بە دەوری مەچەکدا ئالقە کا. سەرەتا نابێ دەست داخا و پاشان لە سەر سنگی دایبنێ، بەڵکوو دەبێ هەر ئەو کاتەی دەست دێنێتە خوارەوە لە سەر سنگی دابنێ -راستتر ئەمەیە- و لەم ماوەیەدا دەست رانەوەشێنێ و زۆر لێکی نەکاتەوە.

---

[1] - واتە: نوێژەکەی هەردەم پێی دەڵێ.

[2]. بێژە هانا دەبەم بە خێوی ئەم خەڵکە.

لە «تەکبیر»دا زێدەڕۆیی نەکا، وەکوو ئەوەی «واو»ێک پاش «**اللّٰه**» دابنێ، یا خۆ «ئەلف»ێک پاش «بێ»ی «**اکبر**» بلێ تاو ببێتە «ئەکبار». ئەمانە هەمووی کاری تاقمی وازوازی و نەزانە. هەر بەو چەشنەی لە کاتی ئاساییدا دەیلێ -بێ‌زێدەڕۆیی و خۆ خستنە ئازار- لە نوێژیشدا هەر وا بلێ.

**خوێندن-** کاتێ دەستی لە سەر یەک دانا «اَللهُ اَکْبَرُ کَبیراً وَ الْحَمْدُ للهِ کَثیراً وَ سُبْحانَ اللهِ بُکْرَةً وَ اَصیلاً[1]» بخوێنێ. پاشان إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ[2] بخوێنێ. پاش ئەوە بلێ: «سُبحانَکَ اَللّٰهُمَّ و بِحَمْدِکَ و تَبارکَ اسْمَکَ و تعالی جَدُّکَ و لا الٰهَ غَیْرُکَ[3]» تا هەموو ئەو ناوانەی لە مەزهەب و دینی جۆراوجۆرایە، بگرێتەوە. پاشان بلێ: «اَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّیطانِ الرَّجیم؛ إنَّ اللهَ هُوَ السَّمیعُ العَلیم[4]» و پاشان بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ[5].

**حەمد و سوورەت:** پاشان سوورەی «الحمد» بخوێنێ. گیرە[6] و کەشە[7]کانی لە جێی خۆی بلێ. لە گوتنی پیتەکاندا زێدەڕۆیی نەکا، بە جۆرێک کە تێک بچن. جیاوازی نێوان «ض» و «ظ» بە جێ بێنێ؛ بەڵام ئەگەر ناتوانێ هەر رەوایە. کە دوایی هێنا «ئامین» بلێ -نە دوا بە دوای سوورەتەکە، بەڵکوو نەختێ رامێنێ، جا بیلێ. پاشان سوورەیەکی‌تر یا خۆ چەن ئایەتێک بخوێنێ. لە دوو رەکاتی سەرەتای بەیانی و شێو و خەوتنان دەنگی هەڵبڕێ، مەگین لە پشتەسەر ئیمامەوە بە جەماعەت نوێژ بخوێنێ.

**رکووع-** پاشان «الله أکبر» بلێت و بڕواتە رکووع؛ دوا بە دوای سوورەکە نەبێ. لە کاتی «الله أکبر»دا وەکوو سەرەتا، دەس هەڵبڕێ تا بناگوێی و ئەوەندە «الله أکبر»ەکەی درێژە پێ بدا تا بە تەواوی بڕواتە رکووع. دەستی لە سەر ئەژنۆکانی دابنێ؛ پەنجەکانی بە درێژایی قیبلە لە سەر ئەژنۆی رابکێشێ- قامکەکانی لێک کراوە بن- و چۆکی راست رابگرێ و نەبچەمێنێ و پشت و سەری راست رابگرێ - وەکوو تەختە- بە چەشنێک وەکوو «لام»ی لێ هاتبێ و باسکەکانی نەنووسابن بە لاپاڵیەوە (ژن باسکەکانی بە خۆیەوە بنووسێنێ و لە لاپاڵی نەیانکاتەوە). کە بەم چەشنە راوەستا سێ‌جار بلێ :

---

١. خوا گەورەترینی گەورەکانە، سپاسی لە رادە بەدەری شایانە و شەوەکی و شێوان یادی پاک و پاراوی دەکەین.

٢. (قورئان،٦/٧٩): وامن بە دڵپاکی رووم کردە ئەو کەسە کە ئاسمانان و زەمینی داهێناوە و لەوانە نیم شەریکی بۆ پەیدا دەکەن.(هـ).

٣. خوایا بە پاک یادت دەکەم و سپاست دەکەم. ناوت پیرۆزە و شوێنت زۆر بەرزە و بێجگە لە تۆش هیچ خوایەکی‌تر نییە.

٤. پەنا دەبەم بە خوا لە دەستی شەیتانی دەرکراو؛ خوایەک کە ژنەوا و زانایە.

٥. وەناو خودای دەهندە و دلۆڤان.(هـ).

٦. گیرە: شەددە، تەشدید « ّ ».

٧. کەشە: مەد « ~ ».

«سُبُحانَ رَبّیَ الْعَظِیمِ وَ بِحَمْدِهِ[1]». ئەگەر بەرنوێژ نەبێ، حەوت یان دە جار بڵێ باشترە. پاشان لە رکووع بێتەوە و قنج راوەستێ و دەست هەڵبڕی و بڵێ: «سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ[2]». کە دەستی هێنایە خوارەوە و راوەستا بڵێ: «رَبَّنا لَکَ الْحَمْد مِلأُ السَّموات وَ مِلأُ الأرض وَ مُلأُ ماشِئْتَ مِنْ شيءٍ بعد».

لە رەکاتی دووەمی نوێژی بەیانیدا، قنووت بخوێنێ.

**کڕنۆش-** پاشان «الله أکبر» بڵێت و کڕنۆش بەرێ. بە چەشنێک بڕواتە سوجدە کە ئەو بەشەی لە ئەندامی نزیکتر لە زەمینە زووتر بگاتە زەمین: سەرەتا ئەژنۆکان، پاشان ناولەپ، دواتر جەمین و کەپۆ. دوو دەستی لە هەمبەر گوێیدا لە سەر زەوی دابنێ (قامکەکانی کراوە بن) دوو قۆڵی بە سەر زەمیندا بکاتەوە و نێوان باسک و تەنشتی و ورگ و رانی ئاوەڵا بێ. (ئافرەتان بە ئاوەژووی ئەمەی بێژرا، دەبێ خۆ کۆ کەنەوە). سێ‌جار بڵێ: « سُبْحانَ رَبِیَ الأَعْلی وَ بِحَمْدِهِ[3]»؛ ئەگەر بەرنوێژ نەبێ، زۆرتر بڵێ چاترە. بڵێ «الله أکبر» و لە کڕنۆش بێتەوە و لە سەر چۆک بە سەر پای چەپیدا دابنیشێ و دوو دەستی لە سەر دوو رانی دابنێ و بڵێ: «رَبِّ اغْفِرْلِي وَ ارْحَمْنِي وَ ارْزُقْنِي وَ اهْدِنِي وَ اَجِرْنِي وَ عَافِنِي وَاعْفُ عَنِّي[4]».

جارێکی‌تر کڕنۆش بەرێ و نەختێ رامێنێ و بڵێ «الله أکبر» و هەستێتەوە سەرپێ بۆ رەکاتی‌تر. ئەم رەکاتەش هەر بەو چەشنە. بەر لەوەی «ألحمد لله» بخوێنێ، بڵێ «أعوذُ بالله مِنَّ الشَّیطانِ الرَّجیم».

**تەشەهود** (تشهد): پاش ئەوەی لە کڕنۆشی دووەم بووەوە، دەبێ دابنیشێ بۆ خوێندنی ئەتەحیات. دەبێ لە سەر پای چەپی دانیشێ -وەکوو نێوان کڕنۆشەکان- و دوو دەستی لە سەر دوو رانی دانێ. بەڵام ئەمجار دەبێ بێجگە لە قامکی شادە، قامکەکانی‌تری دەستی راستی کۆ کاتەوە. کاتێ دەگاتە «الا الله» قامکی شادەی هەڵبڕێ. لە شادەی دووەمیشدا هەروا بکات، بەڵام هەر دو پێی لە ژێرییەوە، لە لای راستییەوە بێنێتە دەرەوە. لە شادەی یەکەمدا کە گەیشتە «اَللّهُمَ صَلّی عَلی مُحَمّدٍ وَ عَلی آلِ مُحَمَّد»، هەستێتە سەر پێ و لە شادەی دووەمدا بە تەواوی تا کۆتایی دۆعای بە ناوبانگ بیخوێنێ و بڵێ: «اَلسَّلامُ عَلَیکُمْ وَ رَحْمَةُ الله» و رووبە لای راستیدا بگێڕێ، بە جۆرێک کە ئەگەر کەسێک لە پشتە سەریەوە دانیشتبێ، لایەک لە روومەتی ببینێ. پاشان هەر بەم چەشنە روو بە لای چەپدا بگێڕێ و

---

١. پاک و پاراوە پەروەرێنەری مەزنم و سوپاس هەر بۆ ئەوە.

٢. خوا سوپاسی شوکرانەبێژی خۆی بیست.

٣. پەروەردگاری بەرزم پاکە و سوپاسی دەکەم.

٤. پەروەرێنەرم! لێم ببوورە و بەزەییت پێمدا بێ و رزق و رۆزیم پێ بدە و هانام بدە و لە بەڵام بیپارێزە و چاو بەسەر سووچەکانم بنووقێنە.

سلاوی نوێژەکەی بداتەوە. بەم دوو سلاوە، نوێژەکەی دوایی دێنێ و ئینجا سلاو بنێرێ بۆ فریشتەکان و پاشان بۆ دانیشتووان.

سەرنج- **لەم کاتانەدا نوێژ کردن نەشیاوە**: لە کاتی برسییەتی، تینوێتی، تووڕەیی و کاتی کاری ئاودەست یاخۆ هەر دڵەراوکێیەک کە ببێتە هۆی ئەوەی بیر لە لای نوێژ و پەروەردگار نەبێ؛ هەروەها لە نوێژدا هەندێ کار نالەبارن، وەکوو نووساندنی دوو پێ پێکەوە ، هەڵبڕینی پێ لە کاتی کڕنۆشدا ، بە جێی چۆکدان، چوار مەشقەدانیشتن، یا خۆ دوو ئەژنۆ بە سنگەوە نووساندن، دەست بردنە ژێر جلوبەرگ، لە کاتی کڕنۆشدا جلوبەرگی خۆ لە بەر و دواوە گرتن، لە ژێر بەرگەوە پشتێن بەستن، دەس داخستن، بە پشت و پەنادا روانین، ئەنگوست تەقاندن، لەش خوراندن، باوێشک دان، دەگەڵ ردێن یاری کردن، بەرد رانان بۆ کڕنۆش، فوو کردنە زەوی لە کاتی کڕنۆش بردندا، قامک لە سەر یەک دانان و پاڵ بە پەنایەکدا دان. ئەنجامدانی ئەمانەی بێژران لە نوێژدا گەلێک ناحەز و دزێون. بەکورتی چاو و دەست و سەرجەمی ئەندامانی لەش، دەبێ بە رێز و حورمەت راوەستن و لە جووڵەی نابەجێ خۆ لادەن، تا ئەوەی نوێژ دوایی دێ و بەکەڵکی توێشووی سەفەری دوارۆژ بێ.

بەڵام فەرزی نوێژ پتر لە دوازدە بەش نییە: نییەت، «الله أکبر»ی یەکەم، رابوون(قیام)، خوێندنی «اَلْحَمد»، رکووع و رامان تێیدا، راستەو بوون لە رکووع، کڕنۆش و رامان لەم دۆخەدا، هەستانەوە لە کڕنۆش و چۆکدان بۆ خوێندنی شادەی دوایی و سەڵەوات بۆ سەر پێغەمبەر(د.خ) و سلاوی نوێژ.

کە ئەمانەی بەجێ هێنا، نوێژەکەی تەواوە و شیری لە روو لادەبرێ[1]. بەلام نابێ کە زۆریش ئارخەیان بێ کە خودای لێی پەزیراویە. ئەمە وەکوو ئەوەیە کەنیزێ بە دیاری ببەنە لای پادشایەک. هەرچەن چاو و گوێ و لووت و دەم و دەست و پێی نییە، بەڵام زیندووە. کەچی کەس دڵنیا نییە پادشا وەریبگرێ یا بیداتەوەسەریانا.

## شرۆڤەی راستەقینەو رووحی نوێژ

بزانە ئەوەی بێژرا رواڵەت و جەستەی نوێژ بوو، ئەم جەستەیە، راستەقینەیەکی هەیە کە رۆحی وییە. ئاگادار بە هەر کردەیەک لە کردەکانی نوێژ و هەر زیکرێ لە زیکرەکان، رۆحێکی تایبەتی هەیە؛ ئەگەر ئەو گیانە نەبێ، نوێژ وەکی مرۆیەکی مردووە و جەستەیەکی بێ‌گیان. بەڵام ئەگەر گیانەکە بێ و کردەکان ناتەواو بن، وەکوو مرۆڤێکی چاو دەرهاتووی، لووت و گوێ بڕاوە. ئەگەر کردەکان تەواو بن، بەڵام رۆح و راستەقینەکەی دەگەڵ نەبێ، وەکوو ئەوەیەچاوی بێ‌سۆما و گوێی نەژنەوای بێ.

بنەمای گیانی نوێژ، خاکەساری و تەیاربوونی دڵە لە هەموو نوێژەکەدا؛ چونکە مەبەست لە نوێژ،

---

1. مەبەست ئەوەیە موسولمانە و کوشتنی رەوا نییە.

رابوونی دڵە لە پێشگای خوای مەزن و نوێ کردنەوەی یادی گەورەیی و مەزنی پەروەردگارە. خوا فەرمووی: «أَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي»؛ واتە: نوێژ بخوێنن بۆ یادی من. پێغەمبەر فەرمووی: «چ زۆرن ئەوانەی کە لە نوێژ، بێجگە لە ماندوویی هیچ بەش نابەن. ئەوەش ئەوانەن کە بە جەستە نوێژ دەخوێنن و بە دڵ خەوتوون». فەرمووی: «زۆرن ئەوانەی کە نوێژ دەکەن، کەچی لەو نوێژەی کە دەیخوێنن شەش یەکێک، یان دەیەکێکیشی بۆ نانووسن، هەر ئەوەندەی لێ دەنووسن کە لەو بەشانەدا دڵی لە هەمبەر پەروەردگار لە نوێژەکەیدا ئامادە بووە». گوتی: «وا نوێژ بخوێنە، وەکوو ئەوەی مالاوایی لە کەسێک دەکەی»؛ واتە بەم نوێژەت، مالاوایی لە ئارەزووەکانی نەفست کە، بەڵکوو لە هەموو شتێ بێجگە لە خوا مالاوایی کە و هەمووی دەگەڵ نوێژ بگۆڕەوە. لەم سۆنگەوە بوو عایشە گووتی: «دەگەڵ پێغەمبەردا پێکەوە قسەمان دەکرد. کە کاتی نوێژ گەیشت، دەتگوت نەقەد ئێمەی ناسیوە و نە ئێمە ئەومان ناسیوە، وا دڵ و گیانی دەپەرژایە سەر یاد خودا». پێغەمبەر فەرمووی: «هەر نوێژێک کە دڵ تێیدا تەیار نەبێ، پەروەردگار پێدا نانواڕێ».

ئیبراهیمی خەلیل(د.خ) کاتێ نوێژی دەخوێند، کوڵی دڵی لە دوو میل لەولاترەوە دەبیسرا. عەلی(خ.ر)کاتێ دەیویست نوێژ بخوێنێ، دڵە لەرزەی لێ دەکەوت و ڕەنگی ڕوومەتی هەڵدەگەڕا و دەیگوت: «هات کاتی گێڕانەوەی ئەو ئەمانەتەی کە بە حەوت ئاسمان و زەوی نوێندرا، کەچی لە خۆیانڕا نەدی کە هەڵیبگرن[1]».

سەفیانی سووری دەڵێ: «هەر نوێژێک کە دڵی تێدا تەیار نەبێ، دروست نییە». حەسەنی بەسریش دەڵێ: «هەر نوێژێک کە دڵی تێدا نەبێ، لە سزادان نزیکترە». مەعازی جەبەل دەڵێ: «ئەوەی لە نوێژڕا بە قەستی سەیری چەپ و ڕاستیکا بۆ ئەوەی بزانێ کێ لە تەنشتی ڕاوەستاوە، ئەو نوێژەی نوێژ نییە».

هەرچەن ئەبووحەنیفە و شافعی گوتوویانە کە نوێژ بە ئامادە بوونی دڵ لە کاتی تەکبیردا (الله أكبر) تەواوە، هۆی ئەم فتوایە ئەوەیە کە بێئاگایی بە سەر مرۆدا زاڵە و واتای دروست بوونی ئەو نوێژە ئەوەیە کە شمشێری لە ڕوو لادەبرێ، بەلام ئەو ڕادەیە دەبێتە توێشووی دواڕۆژ کە دڵ تێیدا تەیار بووبێ. بەکورتی، ئەوەی نوێژ بخوێنێ و لە کاتی تەکبیردا دڵی حازر بێ، هیوا بەوە هەیە کە حاڵ و

---

[1] ئاماژەیە بەم ئایەتە: إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا (قورئان۷۲/۳۳)؛ واتە: ئێمە ئەم ئەمانەتیەمان لە بەرانبەر ئاسمانەکان و زەمین و هەموو کێوانا ڕانا. هیچیان دەخۆیان ڕانەدی بچنە ژێری و لێی دەترسان. پاشان مرۆ وەستۆی خۆی گرت، کە نەیزانی و سەبارەت بە خۆی غەدری کرد.(هـ)

باری باشتر لەوەی بێ کە قەد نوێژ ناکا؛ هەرچەن ترسی ئەوەش هەیە کە حاڵی خراپتر بێ. چونکە ئەوەی بە سستی و نابەدڵی بپەرژێتە سەر کارێک، رەنگە زۆرتر سەختی لێ بگیرێ تا ئەوەی کە قەد نوێژی نەکردووە. بۆیە حەسەنی بەسری دەڵێ: «ئەم نوێژە بە سزا دیتن نزیکترە». لە هەواڵدا هاتووە کە: «ئەوەی نوێژ لە کاری ناحەز و دزێو نەیپارێزێ، لەو نوێژەی هیچ کەڵکی پێ نەگەیشتووە، مەگین دووری لە پەروەردگار».

لەمەی بێژرا تێگەیشتی کە نوێژی تەواو، رۆح و گیانی نوێژەو ئامادەبوونی دڵ لە کاتی نوێژ خوێندندا. ئەوەی دڵی بەتەنیا لە کاتی تەکبیردا ئامادەیە، وەکوو زیندوویەکە کە بەتەنیا پرزەیەکی تێدا ماوە.

**شرۆڤەی راستەقینەی رۆحی کردەکانی نوێژ:** بزانە یەکەم شتێک کە پێت دەگا، بانگی نوێژە؛ کە بیستت دەبێ دەم و دەس و دڵ لە هەرچی بێجگە خوایە هەڵاوێری و لە هەر کاتێکدا کە بێ، دەست راگری. رابردووان وابووگن: کە بانگی نوێژیان بیستووە، ئەوەی ئاسنگەر بووبێ و مووره[1]ی لە دەستا بووبێ، دایناوە، ئەوەی پێڵاودروو بووبێ، درەوشی لە چەرمدا بووبێ دەری نەهێنانەوە و بە یەکجاری رادەبوون بۆ ئەوەی بەم بانگە، بانگی رۆژی پەسڵان یاد کەن و تێگەیشتبوون هەرکەس بەخێرایی بۆ پەرسڤی ئەم بانگە بڕوا، رۆژی پەسڵان بێجگە لە مزگێنی و هەواڵی خۆشی پێ راناگا. ئەگەر وابووی کە بەژنەوتنی بانگی نوێژ دڵت گەشایەوە و پڕ لە تاسە و تامازرۆیی بوو، دڵنیا بە بۆ ئەو بانگەش هەر وا دەبێ.

**تارەت** و نهێنییەکەی، ئەوەیە کە بزانی پاک و پاراو بوونی بەرگ و لەش، وەکوو خاوێنی توێکڵە و گیانی ئەم پاکییە، پاکژی دڵە-بە پاشگەز بوونەوە و دووری لە گوناح و ئاکاری نزم و چرووک، کە لە پێش چاوی پەروەردگارە. جێگای راستەقینەی نوێژ دڵە؛ کەچی لەش جێگای رواڵەتی نوێژە.

**داپۆشینی شەرمگا:** واتە ئەو شتەی لە رواڵەتت دزێو و ناحەزە و شیاوی دیتن نییە، لە چاوی خەڵکی داپۆشی؛ رۆح و نهێنییەکەی ئەوەیە کە ئەو شتەی لە دەروونت دزێو و ناشیرین و ناحەزە، لە پێش چاوی پەروەردگارت داپۆشی و ئەوەش دەزانی کە هیچ شت لە ئەو شاراوە نییە، مەگین ئەوەی نووکوبەدی بسڕێتەوە. پاک بوونەوەشی وایە کە دەبێ لە گوناحەکانت پەژیوان و پاشگەز بیەوە و بە دڵ بلێی ناگەڕێمەوە سەری «التّائبُ مِنَ الذَّنْبِ کَمَن لاذَنْبَ لَهُ»؛ واتە، پاشگەز بوو لە گوناح، وەکوو ئەوەیە تووشی تاوان نەهاتبێ. پاشگەز بوونەوە، گوناحەکان بچووک و بێقیمەت دەکا، ئەگەر بتوانی

---

[1]. موورە: چەکوش.

پەردەیەک لە شەرم و شوورەیی و ترس و شەرمەساری بە سەر شـەرمگاکانـت[1] بکێـشی و دڵشـکاو و پەژیوان لە پێش پەروەردگارت راوەستی، وەکوو کۆیلەیەکی تاوانبـار و شـەرمـسار و دڵپـڕ لـە خـەم و کەسەر، بگەڕێتەوە لای خودانی خۆی و بە بۆنەی تاوان و گوناحیەوە لە رووی نـەیـێ سـەر هـەڵـبڕێ، بۆی باشترە.

**روو لە قیبلە کردن:** واتە رووی رواڵەتت لە هەمـوو رەهـەنـدەکـان بگێـڕەوە و بـەرەو یـەک شـوێن راوەستە. کاکڵەی ئەمەش ئەوەیە روو لە هەموو شتی هەر دوو جیهان بگێڕەوە و بپەرژە سەر بـەنـدگی خودا تا رێ ببەیتە سەر دانستەکانی. هەر وەکوو چۆن قیبلەی رواڵەت یەکە، قیبلەی دڵـیش یـەکـە و ئەوەش خودای پاک و دلۆڤانە. کە دڵ لە نێو دەریای خەیاڵ و ئەندیشەی جۆربەجۆر نوقم و هـەڵـوەدا بوو، وەکوو ئەوەیە روو وەرگێـڕی بـە هـەمـوو لادا. چـۆن وەرگـەڕانـدنی روو نـوێژ بـەتـاڵ دەکاتـەوە، وەرگێڕانی رووی دڵیش راسـتەقینـەو رۆحـی نـوێژ پووچـەڵ دەکاتـەوە. بۆیـە پێغـەمبـەری خـواش فەرمووی: «ئەوەی بۆ نوێژ راوەستێ و بیر و خەیاڵ و ڕوومەتی دڵی لە بەر بارەگای پەروەردگـار ئامـادە بێ، کە لە نوێژ بووەوە، وەکوو رۆژی لە دایک بوونی، وایە؛ واتە، لە هـەمـوو سـووچ و گوناحێـک پـاک و خاوێن دەبێتەوە».

بەڕاستی، بزانە چـۆن روو وەرگـەڕانـدن لـە قیبلـە، رواڵـەتی نـوێژ بـەتـاڵ دەکاتـەوە، رووی دڵ لـە پەروەردگار وەرچەرخاندن و دڵ و مێشک پەرژاندنە سەر خەیاڵیتر، راستەقینەی رووحی نـوێژ بـەتـاڵ دەکاتەوە؛ گرینگتر و هێژاتریش هەر دڵە. رواڵەت، توێکڵی دەروونە و گرینگ و پڕبایەختر کاکڵەیـەکـە لە توێکڵدا شاراوەیە و توێکڵ بۆ خۆی بایەخێکی ئەوتۆی نییە.

**رابوون:** لە رواڵەتدا بریتییە لەوەی کە جەستەی لە بەرانبەر خوای مەزنەوە، سەر لە بەر و دەست لـە سەر سنگ راوەستێ. نهێنییەکەشی ئەوەیە کە دڵ لە هەموو کارێ بێتەوە و وەک خزمـەتکـار دەسـت لە سەر سینگ راوەستێ و یادی ملکەچی و راوەستانی لـەبـەر بـارەگـای پـەروەردگـار کـا لـە رۆژی پەسڵانا، لەو دەمەیڕا کە هەموو راز و نهێنییەکانی خویان دەبن و لە پێشی رایدەنێن. باش بزانـێ کـە ئەم هەموو راز و نهێنییە هەر لەم کاتـە و لـەم دونیایـە لـە پـەروەردگـار ئاشـکرایە: ئـەوەی لـە دڵ و دەروونیدا بووە و هەیە، بە نووکوبەدی دەزانێ و بەسەر رواڵەت و دەروونی ئاگادارە.

سەیر ئەوەیە ئەگەر پیاوچاکێک سەیری نوێژ خوێندنی کا، زۆر بەڕێز و حورمـەت دەبـزوێ و بێجگـە لەوەی فەرزی نوێژە، هیچ ناجووڵێ و زۆر لەسەرخۆ و بە کاوەخۆ و بێئاوڕدانەوە لـە دەورو پـشتی نـوێژ دەخوێنێ؛ کەچی دەزانێ پەروەردگار بۆی دەڕوانێ و شەرمی لێ ناکا. ئەمەچ گێلییـەکـە لـە بـەنـدەی

---

[1] ۱. مەبەست شەرمگای دڵە و شەرمەکانیش مەبەست و ئارەزووی خراپ و کردەوەی ناحەزن.

بێئەنوا -کە بەسەر خۆشیدا دەسەڵاتی نییە- شەرم دەکا، کەچی لە پادشای پادشایان شەرمی نییە و بە سانایی لێی دەبوێرێ.

لەم سۆنگەوە بوو هورەیرە گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! شەرم لە خودای گەورەی مەزن چۆنە؟» فەرمووی: «بەو چەشنەی کە لە پیاوچاکێکی بنەماڵەت شەرم دەکەی». بە هۆی ئەم ڕێزگرتنەبوو کە تاقمێ لە یارانی پێغەمبەر، کاتێ بۆ نوێژ ڕادەوەستان، وا بێ جووڵە بوون کە مەل سڵی لێ نەدەکردنەوە، بە دار و بەردی دەزانین. ئەوەی بە دڵ هەستی بە گەورەیی خوای مەزن کرد و زانی کە لە هەموو کات و هەموو شوێن چاودێریە، هەموو لەشی دەبێتە خاکەساری.

لەم سۆنگەوە بوو کاتێ پێغەمبەر یەکێکی بینی لە کاتی نوێژدا دەستی بە ڕدێنیدا دەهێنا، فەرمووی: «ئەگەر بە دڵ خاکەسار بوایە، دەستیشی وەکوو دڵی بوو».

**ڕکووع و کڕنۆش**: لە ڕواڵەتدا خۆ بە کەمزانی و خاکەسارییە بە لەش؛ ڕاز و نهێنییەکەشی خاکەساری و خۆ بە کەمزانی دڵە. ئەوەی سەری لە سەر خاک دادەنێ، بۆ ئەوەیە بیر بکاتەوە کە هێژاترین بەشی لەش، واتە سەری، دەنێتە سەر پەستترین و نەویترینی هەموو شتان، واتە خاک؛ تا بزانێ کە ئاخێزگەی و دوایین مەنزڵێک کە دەیگرێتەکۆش هەر خاکە: لە بناوانی خۆیدا ڕامێنێ تا بێدەرەتانی و بێئەنوایی خۆی بناسێ. بە گشتی لە هەر کارێکدا ڕاستەقینە و نهێنییەک شراوەیە، کە چوون ئاگای لێ بڕاو و خێی پێ نەدا، بێجگە لە ڕواڵەت هیچیتری دەست ناکەوێ.

**شرۆڤەی ڕاستەقینەی زیکر و قورئان خوێندن لە نوێژدا**: باش بزانە هەر وشەیەک کە لە نوێژدا دەبێ بیڵێی، ڕاستەقینەیەکە کە دەبێ بۆت ڕوون بێتەوە و بێژەریش دەبێ خێوی ئەو دانستەیە بێ، تا لە ڕیزی ڕاستبێژان بێ. بۆ نموونە واتای «الله أکبر» ئەوەیە کە «خوا گەورەیە»؛ ئەگەر لەم واتایە تێنەگا، نەزانە و ئەگەریش تێگەیشت، کەچی دەیزانی لە ناخی دڵیدا شتێک گەورەتر لە «**الله**» هەیە، ئەوە ڕاسبێژ نییە و پێی دەڵێن: «ئەم پەیڤە ڕاستە، بەڵام تۆ درۆ دەکەی». هەر کات بۆ شتێک بێجگە لە پەروەردگار زۆرتر سەری نەوی کرد و ئالقەلە گوێ بوو، ئەو شتەی لە لا گەورەتر لە پەروەردگارە و خوای ئەو، ئەو شتەیە کە بە دڵ کڕنۆشی بۆ دەبا. هەر وەک خودای مەزن دەڵێ: أَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ؟[1] کاتێ گوتی: وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضَ ، مەبەست ئەوەیە کە ڕووی دڵم لە هەموو جیهان وەرگەڕاندەلای خودای مەزنەوە. ئەگەر لەو دەمەیڕا دڵی لە سەر بابەتێکیتر ڕامابوو، پەیڤەکەی لە ڕاستی بە دوورە؛ جا کە لە ئاخاوتن دەگەڵ پەروەردگاردا، یەکەم

---

[1] - قورئان(٤٣/٢٥) تۆ ئەو کەسەت دی کە هەرچی خۆی حەز بکا دەیکاتە پەرستیوی خۆی؟(هـ)

قسەی درۆ بوو، مەترسییەکی ئاشکرا هەیە. کە گوتی: «حنیفا مسلماً[1]» و خۆی بە موسوڵمان نواند، پێغەمبەر فەرمووی: «موسوڵمان ئەوەیە موسوڵمانان لە دەست و زمانی ئەمانیان بێ»، دەبێ یا خێوی ئەم دانستەیە بێ یا خۆ هان بدا وای لێ بێ.

کە گوتی: «ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ[2]»، دەبێ چاکەکانی پەروەردگار بە بیریدا تێپەڕێنێ تا هەموو گیانی شوکرانەبژێر بێ، چونکە ئەمەیە واتای شوکرانەبژێری و سپاسیش بە دڵە.

کە گوتی: «إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ[3]»، دەبێ کە دڵی بێخەوش و گەرد و پاکژ کا.

کە گوتی: «ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ[4]»، دەبێ بە دڵ بپاڕێتەوە و زاری بکا، چونکە خەریکی دەرۆزەییە بۆ شارەزا بوون لە ڕاستەڕێ. لە وتنی هەر وشەیەکی تەسبیحات و تەلیلە و قورئاندا بەو مەرەدە[5]ی بێ کە شیاوە و دەیزانێ و دڵی خۆشی لە هەمان دۆخدا بێ. ڕاڤەی ئەم بابەتە درێژ خایەنە.

ئەگەر بیهەوێ لە ڕاستەقینەی نوێژ بەهرەیەکی پێ بگات، دەبێ وابێ؛ ئەگینا هەر بە ڕواڵەتی بێناوەرۆک ڕازی بووە.

**دەرمانی دڵ بۆ ئامادەبوون لە نوێژدا:** بێئاگایی و تەیار نەبوونی دڵ لە نوێژ، دوو هۆی هەیە: یەکەم ڕواڵەتە و دووەم دەروون.

هۆی ڕواڵەتی ئەوەیە کە لە شوێنێکدا نوێژ دەکا شت دەبینێ یا خۆ ئەژنەوێ و دڵی دەپەرژێتە سەریان، چونکە دڵ دەداتەپەی[6] چاو و گوێ. چاری ئەوەیە لە جێگایەک نوێژکا کە نە دەنگێ بژنەوێ و نە شتێ ببینێ و بۆ ئەم مەبەستەش ئەگەر شوێنێکیتاریک بێ چاترە یا خۆ چاوی لەسەریەک دابنێ. زۆربەی عابدەکان، بۆ عیبادەت ژوورێکی نزم و تاریک هەڵدەبژێرن؛ چونکە لە شوێنی بەرفراواندا دڵ کەمتر ڕادەمێنێ. ئیبنی عومەر هەر کات کە نوێژی دەخوێند، شیر و کتێب و هەر کۆتاڵێ لە پێشی بوایە، لای دەبرد تا چاو بۆی نەڕوانێ و دڵ بێئاگا نەکا.

---

[1] - منم موسوڵمانی پاکدین.

[2] - قورئان (٢/١) سپاس بۆ خودا.

[3] - قورئان(٥/١) ئێمە هەر تۆ دەپەرستین، پشتن هەر بە تۆ دەبەستین.(هـ)

[4] - قورئان(٦/١) لە ڕاستەڕێ شارەزان کە. (هـ)

٥. مەرەد: حاڵ.

٤. دانە پەی: کەوتنە دووی.

هۆی دووەم لە ناخەوەیە و ئەوەش بیر و خەیاڵی ئاڵۆز و پڕ ئاژاوەیە. ئەمە گەلێک دژوارترە و بە دوو جۆرە:

**یەکەم** کار و ئەرکێکە کە دڵی پەرژاندۆتە سەر خۆ. چارەسەریشی ئەوەیە سەرەتا کارەکەی دوایی بێنێ و دڵی لە بیر و خەیاڵی دەرباز بکا و ئینجا نوێژ بخوێنێ. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «إذا حَضَرَ العشاءُ وَالعشاءُ فَابْدَؤا بِالْعشاء»؛ واتە، کە نوێژ و چێشتی شیو پێکەوە گەیشتن، سەرەتا شیوەکەتان بخۆن، پاشان نوێژ کەن. هەروەها ئەگەر پەیڤێکی دەگەڵ کەسێک هەیە، سەرەتا قسەکەی بکات و دڵ لە خەیاڵی ئەو قسەیە دەرباز کا و پاشان بۆ نوێژ رابێ.

**دووەم** خەیاڵی بابەتێک بێ کە بە خێرایی دوایی نەیە، یا خۆ بیرێکی ئاڵۆز و پەرێشان دایگرتبێ. چاری ئەم دەردەش خەریک بوون بە زیکر و یادی خودا و خوێندنی قورئان و قووڵ بوونەوەو ورد بوونەوە لە واتاکانییە تا لە بیری ئاڵۆز و بێسەرو بەر دەرباز بێ. ئەمەدەتوانێ چاری ئەو دەردە بێ، بەو مەرجەی ئەو بیر و خەیاڵە بە سەریدا زاڵ نەبووبێ و پرزەی لێ نەبڕیبێ. کە ئەگەر وابوو و شاوەتی ئەو خەیاڵە زاڵ بوو بە سەریدا، بەم جۆرە لێی نابێتەوە: دەبێ بە خواردنی دەرمانێکی رەوانکەر، هۆ و سەرچاوەی نەخۆشی لە دەروونا بنەبڕ کا. ئەو دەرمانەش ئەوەیە کە تەرکی هۆ و سەرچاوەی ئەو بیر و خەیاڵە کا و خۆی لێ دەرباز کا. ئەگەر نەتوانێ خۆی لێ رزگار کا، قەد ئەم خەیاڵەی لە دڵ نارەوێ و هەموو کات نوێژی تژی[1] لەباسی نەفسە. ئەوە چیرۆکی ئەو کەسەیە لە ژێر دارێک خەریکی حەسانەوەیە و جریوەجریوی چۆلەکەش ئازاری دەدەن. بە بەرد راویان دەنێ، کە دەیەوێ دیسان رابکشێ، چۆلەکەجریوەجریو دەگەڕێنەوە. ئەگەر دەیەوێ بە یەکجاری لە دەنگی چۆلەکە رزگاری بێ، چارەی بڕینەوەی دارەکەیە؛ چونکە تا دارە هەبێ، خانووی چۆلەکەکان لە نێو لق و پۆ و گەڵای دارەکەیە. هەروەها تا شاوەت و داخوازی کارێک لە دڵدا بێ، ناچار بیر و خەیاڵی ئاڵۆزی دەگەڵایە. بەم بۆنەوە بوو کاتێ جلکێکی جوان و رازاوەیان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر، کە لە نوێژدا بوو چاوی بە نەخش و نیگاری زۆر جوانی بەرگەکەی کەوت، بەخێرایی بەرگەکەی داکەند و دایەوە بە برادەری دیاریهێنەر و جلکەکەی خۆی کردەوە بەر.

جارێک دەواڵێکی[2] نوێیان بە سەر پێڵاوەکەی پێغەمبەردا بەست. لە نوێژدا چاوی پێکەوت، زۆر جوان بوو. پاش نوێژ لە پێڵاوەکەی کردەوە و دواڵە کۆنەکەی خۆی بەستەوە. جارێک شەکاڵێکی[3] نوێیان چێ کرد، زۆر جوان بوو، حەزی لێ کرد. کڕنۆشی برد و فەرمووی: «خاکەسارم لە بەر بارەگای

---

١. تژی: پڕ.

٢. دەواڵ: قاییش، نەوارلک لە چەرم.

٣. پێڵاوی سەربەموو چینراو.

پەروەردگار، تا ڕۆژی پەسلان بەم حەزەی کە بە دڵمدا ڕابورد، وەکوو دوژمن سەیری نەکا»؛ لە پێی دایکەند و کە یەکەم هەژاری بینی، پێی بەخشی.

تەلحە لە نێو باخە خورماکەیدا خەریکی خوێندنی نوێژ بوو. لەپڕ بینی مەلێکی زۆر جوان، لە نێو لق و پۆی دارەکاندا قەتیس ماوە و ڕێ دەرناکا. دڵی بۆی سووتا و بیری پێوە پەرژا، نەیزانی چەن ڕەکاتی نوێژ کردووە. ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەر و گازندەی لە دڵی خۆی کرد. بۆیە لە کەفارەی ئەو دڵئاژاوەیەدا، باخی خورماکەی دا بە هەژاران.

پێشوونان زۆربەیان بەم شۆپەدا ڕۆیشتن و چارەی تەیارکردنی دڵیان بەوە زانیوە. بەکورتی ئەگەر بەر لە نوێژ دڵ خەریکی یادی خوا نەبێ، لە کاتی نوێژیشدا تەیار نابێ و بیرێک کە دزەی کردە نێو دڵ، بەو جۆرەی کە لە نوێژیشدا لێی نەبووەوە، لە کۆڵی دڵ نابێتەوە. هەرکات کە ویستی بە ئامادە و تەیار بوونی دڵ نوێژ بخوێنێ، دەبێ بەر لەوە چاری دڵ کا و لە یادی غەیری خوا ڕزگاری کا. ئەمەش لەم سۆنگەوە دەگاتە ئەنجام کە خۆ لە بەندی گیروگرفتەکانی دونیا دەرباز کا و لە دونیا بە قەدەر نیازی داوا کا. مەبەستیشی لەو قنیات کردنە، ئاسوودەیی لە کاتی عیبادەت بێ. کەوانەبێ، دڵ مەگین لە هەندێ نوێژدا، ئەگینا دیسان هەر حازر و ئامادە نابێ: دەبێ نوێژی موستەحەب (نوافل) زۆر بخوێنێ و هان بدا تا دڵی حازر و تەیار کا بە قەدەر فەرزێک. چونکە نەوافێل قەرەوی فەرزەکانە.

## ڕاڤەی نوێژی جەماعەت

پێغەمبەر فەرمووی: «یەک ڕەکات نوێژی جەماعەت، وەکوو بیستوحەوت ڕەکات نوێژی بە تەنیاییە». هەروەها فەرمووی: «ئەوەی نوێژی خەوتنان بە جەماعەت بخوێنێ، وەکوو ئەوەیە نیوەشەوێک شەونخوونی کێشابێ؛ ئەوەش نوێژی بەیانان بە جەماعەت بخوێنێ، وەکوو ئەوەی تەواوی شەوێک خەریکی شەونوێژ بووبێ». هەروەها: «ئەوەی بەردەوام چل ڕۆژ نوێژ بە جەماعەت کا، بە چەشنێک کە تەکبیری یەکەمی نەفەوتێ، لە دوو شت پاک و خاوێن و بەری دەبێ: یەکێک مەرایی و دووڕوویی، دووەم دۆزەخ».

بەم بۆنەوە بوو کە هەریەک لە پێشوونان تەکبیری یەکەمی بفەوتایە، سێ ڕۆژ خۆی ئازار دەدا و ئەگەر نوێژێکی جەماعەتی بفەوتایە، حەوت ڕۆژ هەدای نەدەدا و خۆی دەڕەنجان.

سەعیدی موسەییێب گوتوویە: «بیست ساڵ بانگی نوێژ ئەژنەوم. قەد نەبووە پێش بانگ گوتن لە مزگەوتدا نەبووبێتم». زۆر لە زانایان گوتوویانە: «ئەگەر کەسێک بەبێ عوزر و بیانوو، نوێژ بە جەماعەت نەخوێنێ، نوێژەی دروست نییە». کەواتە، دەبێ جەماعەت بە گرینگ بزانرێ و داب و نەریتی پێش نوێژیش ڕابگیرێ.

یەکەم نابێ بەرنوێژی کا، مەگین ئەوەی خەڵکی دڵخۆشیان دابێتەوە و ئەگەر حەزیان لێ نەکرد، دەبێ لە بەرنوێژی خۆی بپارێزێ. کە تکایان لێ کرد، بەبێ بیانوویەکی گونجاو خۆی بە دوور نەگرێ؛ چونکە بەرنوێژی گەلێک هەڤیازە[1]، تەنانەت لە بانگبێژی هێژاترە. دەبێ لە راگرتنی پاک و خاوێنی بەرگەکانیا وشیار بێ و ئاگاداری کاتی نوێژ بێ و لە سەرەتای هەڵی نوێژدا نوێژ کا و خەڵکی چاوەنۆڕی خۆی نەکا؛ چونکە نوێژ لە هەوەڵی کات هێژاترە. لە نێو یارانی پێغەمبەردا کاتێ دووکەس حازر دەبوون، چاوەڕوانی کەسی سێهەمیان نەدەکرد و لە سەر جەنازەدا کە چوارکەس ئامادە بوون، چاوەڕوانی کەسی پێنجەمیان نەدەکرد. رۆژێ پێغەمبەر دیرتر هات، نەوەستانە دووی و عەبدوڕەحمانی عەوف بوو بە بەرنوێژ. کاتێ پێغەمبەر هات یەک ڕەکات لە نوێژ خوێندرا بوو. کە نوێژ دوایی هات، هەموو ترسان، پێغەمبەر فەرمووی: «کاری چاکتان کرد، هەرجار وا بکەن».

دەبێ بۆ ڕەزای خوا و بەدڵپاکیوە بەرنوێژی کا و هیچ پارە وەرنەگرێ و تا هەموو جەماعەت ڕانەبن، «اَللّٰهُ اَکْبَر» نەڵێ و «اَللّٰهُ اَکْبَر»ەکانی بە دەنگێ بەرز بڵێ و نییەتی بەرنوێژی بێنێ تا خێرەکەی پێ بگا. ئەگەر نییەتی بەرنوێژی نەهێنێ، نوێژەکەی دروستە، کەچی خێری نوێژی جەماعەتی پێ ناگا.

لە نوێژە ئاشکرا[2]کاندا بە دەنگی بەرز قورئان بخوێنێ. سێجار بێدەنگ بێ: یەکەم کاتێ تەکبیری گوت و «وَجَّهْتُ وَجْهِيَ»ی خوێند و نوێژخوێنان خەریکی خوێندنی سورە «الفاتحە» بوون؛ دووەم، کاتێ «الفاتحە»ی خوێند، ماوەیەک بێدەنگ بێ تا ئەوەی سوورەتی «فاتحە»ی نەخوێندووە، بیخوێنێ؛ سێهەم کە سوورەی پاش سوورەی فاتیحەی خوێند، نەختێ بێدەنگ بێ تا «اَللّٰهُ اَکْبَر» گوتنەکەی دوا بە دوای سوورەتەکە نەبێ. پاش نوێژ[3]یش بێجگە لە سوورەتی فاتحە، هیچی دی نەخوێنێ، مەگین دوور بێ و دەنگی مامۆستا یان بەرنوێژ نەبیسێ. رکووع و سجوودی کورت بێ و هەریەکەی سێجار زیاتر نەڵێتەوە.

ئەنەس دەڵێ: «کەس تەواوتر و خێراتر لە پێغەمبەر نوێژی جەماعەتی نەدەکرد». سوننەت وایە کە نوێژ زۆر درێژ نەکرێتەوە، نەکوا کەسێک کەمهێز یا خۆ بە پەلە بێ. دەبێ پاشنوێژ (ماموم)، پاش ئیمام بڕوا، نەک دەگەڵ ئەو: تا ئیمام جەمینی لە سوجدەگا دانەنێ، مەئمووم نابێ کڕنۆش ببا، تا نەڕواتە رکووع، نابێ بڕواتە رکووع؛ شوێن کەوتن ئاوەهایە. ئەگەر مەئمووم بە قەستی بکەوێتە پێش، نوێژی بەتاڵ دەبێتەوە.

بەرنوێژ دەبێ پاش سڵاو دانەوە هەر ئەوەندە لە پێشەوە بمێنی کە بڵێ: «اَللّٰهُمَّ اَنْتَ السَّلامُ وَ مِنْکَ

---

[1] ١. هەڤیاز: هەڵبژاردە، بژاردە.

[2] ١. نوێژی ئاشکرا: نوێژی جەهری(جهری): نوێژی بەیانی، شێو(مغرب) و نوێژی خەوتنان(عشاء).

[3] ٢. پاش نوێژ: ماموم.

السَّلامُ تَبارَکْتَ یا ذَالجَلالِ وَالإِکْرام[۱]» و خێرا هەستێ روو لە خەڵکەکە کا و دوعای بـەخێریـان بـۆ بکـا. خەڵکی پێش ئەو سڵاوی نوێژ نەدەنەوە، چۆنکە مەکرووهە.

## راڤەی خێری نوێژی هەینی

بزانە کە رۆژی هەینی، رۆژێکی گەلێک هێژایە و خێر و ودمی زۆر و زەوەندە و جێژنی بڕوادارانە.

پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی بەبێ هیچ عوزر و بیانوویەک سێ‌هەینی خۆی لە نوێژی هـەیـنی لادا، ئیسلامی خستۆتە پشت گوێ و دڵی رەش داهاتووە».

لە هەواڵدا هاتووە کە پەروەردگار هەموو هەینییەک شەشسەدهەزار کۆیلـە لـە دۆزەخ دەربـاز دەکـا. پێغەمبەر فەرمووی: «ئێوارانی هەموو رۆژ، ئاوری دۆزەخ نێڵ و تاو دەدرێ، مەگین رۆژانی هەیـنی کـە تاوی نادەن». هەروەها فەرمووی: «ئەوەی رۆژی هەینی بە رەحمـەتی خـودا بچـێ، دەخرێتـە ریـزی شەهیدان و عەزاوی قەبری تووش نابێ».

**مەرجەکانی نوێژ هەینی**: بێجگە لەو مەرجانەی لە نوێژانی‌تردا هەیە و بـۆ نـوێژی هـەینـیش هـەیـە، نوێژی هەینی شەش مەرجی تایبەتی هەیە:

**مەرجی یەکەم**: کاتە؛ بۆ وێنە ئەگەر ئیمام کاتێ سڵاوی نوێژ دەداتەوە، کاتی نوێژی نیوەڕۆ رابوردبـێ و نوێژی عەسر گەیشتبێ، دەبێ نوێژی نیوەڕۆ بە تەواوی بخوێنێ و نوێژی هەینیەکەی فەوتاوە.

**مەرجی دووەم**: شوێن و جێگایە. ئـەم نـوێژە نابـێ نـە لـە چـۆڵ و بیابـان، نـە لـە رەشمـاڵ و دەوار بخوێنرێ؛ بەڵکوو دەبێ یا لە شارێک یا خۆ لە گوندێک کە پتر لە چل‌کەس پیاوی ژێـر و عاقـڵی تێـدا بێ بخوێنرێ. ئەگەر لە مزگەفتیش‌دا نەبێ، هەر دەبێ.

**مەرجی سێهەم**: ژمارەی نوێژخوێنانە. تاکوو چل پیاوی ئازادی تەکلیف لـە سـەری دانـشتووی ئـەو وڵاتە کۆوە نەبن، نوێژ بەجێ نایە. ئەگەر ئەم ژمارەیە لە خوتبە یان نـوێژدا کـەمتـر بـێ، وا دەڵـێن کـە رێکی نایە.

**مەرجی چوارەم**: جەماعەتە. ئەم تاقمە نابێ هەریەکە و بەتەنیا نوێژ کەن. هەرچەند ئەگەر کەسـێک لە رەکاتی دووهەم راگەیشت و بە تەنیا لە رەکاتی یەکەمدا دەگەڵ جەماعەت بـوو و رەکـاتی دووەمـی تەنیا بوو، ئەو نوێژەی دروست و راستە، کەچی ئەگەر بە رەکاتی دووهەم رانەگـەیـشت، دەبـێ نییـەتی نوێژی نیوەڕۆ بێنێ و نوێژی هەینی فەوتاوە.

---

۳. پەروەردگار! خوت پاکی و پاکیش لە تویە، بەرز و پیرۆزی ئەی خاوەن شکۆی بەرێز و حورمەت.

**مەرجی پێنجەم**: دەبێ پێش ئەوە -لەو شارە و لەو کاتە- نوێژی هەینی نەخوێندبێ؛ چونکە لە شارێکدا زۆرتر لە یەک نوێژی هەینی شیاو نییە؛ مەگین ئەوە لە مزگەفتێکدا نەگونجن یا گونجانیان دژوار بێ. ئەگەر وابوو و دوو نوێژی جومعەیان بەجێ هێنا، باشتر ئەوەیە کە «**تکبیر**»ی یەکەم پێشتر بڵێن.

**مەرجی شەشەم**: بەر لە نوێژ دوو خوتبە هەیە و هەردووشیان فەرزن و هەم چۆکدان لە نێوان دوو خوتبەکەدا فەرزە و هەمیش رابوون لە دوو خوتبەکەدا فەرزە. لە خوتبەی یەکەمدا چوار شت فەرزە: سوپاسی خودا -**اَلْحَمْدُ لِلّه** وتن بەستە- سڵاوناردن بۆ پێغەمبەر(د.خ)، راسپاردن بۆ پارێزکاریوتنی «اوُصیکُم عِبادَاللهِ بِتَقوَی الله» بەسیە- چوارم ئایەتێک لە قورئان بخوێنێ. لە خوتبەی دووهەمڕا ئەوەی بێژرا دەبێژرێتەوە، بێجگە لەوەی کە بە جێی ئایەتی قورئان، خوێندنی دوعا فەرزە.

ئەم نوێژە بە سەر ژنان و منداڵان و کۆیلە و مسافراندا پێویست نیە. ئەگەر بە بیانووی قوڕ و باران و نەخۆشداریەوە -بەو مەرجەی نەخۆش کەسیتری نەبێ ئاگای لێ بێ- نوێژی هەینی بەجێی نەهێنرێ، رەوایە، بەڵام باشتر ئەوەیە نوێژی نیوەڕۆ پاش دوایی هاتنی نوێژی هەینی بخوێنرێ.

**نەریتی نوێژی هەینی**: لە نوێژی هەینیدا دە شت سوننەتە و دەبێ نەریتی رابگیرێ:

**یەکەم**: رۆژی پێنجشەمۆ، بە دڵ پێشوازی لە رۆژی هەینی کا و کارەکانی هەینی جێبەجێ کا، وەکوو دابینکردنی جلوبەرگی سپی و ئەو کارانەی دەبێ جێبەجێ بکرێن؛ تا بەیانی بۆ نوێژ بڕوا. لە کاتی نوێژی عەسری پێنجشەمۆدا بە تەنیا دانشتن و لە یادی خوادا نوقم بوون، خێر و ودمی زۆر و زەوەندی هەیە، چونکە لە بەرانبەریدا کاتێکی گەلێک هێژا لە رۆژی هەینیداهەیە. دەڵێن لەم شەوەدا نزیکبوون لە ژنی خۆ سوننەتە تا ئەوەی هەردووکیان لە رۆژی هەینیدا غوسڵ بێنن.

**دووەم**، دەبێ بەیانی غوسڵ بێنێ -ئەگەر زوو دەڕوا بۆ مزگەوت- ئەگینا دیرتر بێ باشترە و پێغەمبەر لە سەر غوسڵی هەینی شێلگیری[1] کردووە، بە رادەیەک کە هەندێ لە زانایان پێیان وابووە ئەم غوسڵە فەرزە. خەڵکی مەدینە ئەگەر جنێویان بە کەسێ بدایە، دەیانگوت: «تۆ خراپتری لەو کەسەی رۆژی هەینی غوسڵ ناکا». ئەگەر کەسێک لەم رۆژەدا توخنی ژنی کەوتبێ و بیەوێ لەشپیسی دەرکا، باشتر وایە پاش ئەوە ئاو بە خۆدا برژێنێ و نییەتی غوسڵی رۆژی هەینیش بێنێ. ئەگەر بە یەکجار غوسڵ، هەر دوو نییەتەکە بێنێ، بەسیەتی و غوسڵی جومعەشی بەجێهێناوە.

**سێهەم**، دەبێ جوان و خوشیک و رازاوە و خاوێن بڕوا بۆ مزگەفت. خاوێنی ئەوەیە کە مووی سڕیبێ، نینۆکی کورتەو کردبێ و سوێلی رێک کردبێ. ئەگەر پێشتر بۆ گەرماو رۆیشتبێ و ئەم

---

١. شێلگیری: پێداگری، جەخت.

ئەرکەی بەجێ هێنابێ، بەسیە. رازاوەیی بەوەیە کە بەرگی سپی کردبێتە بەر، چونکە پەروەردگار بەرگی سپی خۆش دەوێ؛ بە مەبەستی ڕێزگرتنی مزگەوت، بۆن و بەرامەی خۆشی لە خۆی دابێ، تا بۆنی ناخۆشی لێ نەیێ و کەس بەو بۆنەنەڕەنجێ.

**چوارەم؛** لە کاتی کازیوەدا رۆیشتن بۆ مزگەوت خێرو ودمی زۆرە. لە سەرەتای ئیسلامدا، ئەوەندە زوو دەڕۆیشتن بۆ مزگەوت، کە ناچار چرایان دەگەڵ خۆیان دەبرد؛ ڕێگاکانی مزگەفت ئەوەندە جەنجاڵ بوون کە رۆیشتن گەلێک دژوار بوو. ئیبنی مەسعوود لە ڕێگایەکەوە بۆ مزگەوت رۆیشت، سێ‌کەس پێش ئەو بوون. خۆی لۆمە دەکرد و دەیگوت: «تۆ لەچوارەم رادەی، کارت چۆن دەبێ؟».

دەڵێن یەکەم نووژەنێک[1] کە لە ئیسلامدا ساز کرا، لابردنی ئەم سوننەتە بوو. کە جوو و فەلە، رۆژانی شەمۆ و یەکشەمۆ بەیانی زوو دەڕۆن بۆ کەنیسە و کلیسا، موسوڵمانان لە رۆژی هەینیدا -کە رۆژی خۆیانە- چۆن لە رۆیشتنە مزگەوت سستی دەکەن؟

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس لە یەکەم کاتی ئەم رۆژەدا بڕوات بۆ مزگەوت، وەکوو ئەوەیە حوشترێکی قوربانی کردبێ؛ ئەگەر درەنگتر بڕوا، گایەکی بەقوربانی کردووە؛ درەنگتر لەوە، مەڕێ، لەوەش درەنگتر مریشکێ، لەوە درەنگتر، هێلکە مریشکێک و کە وتەبێژ لە سەر مینبەر ڕۆنیشت، ئەو فریشتانەی ئەم خێرانە دەنووسن، دەفتەرەکانیان لێک دەنێن و گوێ بۆ وتارەکان رادەگرن و ئەوەی لەمە بە دواوە بێ، بێجگە لە خێری نوێژ هیچیتری پێ ناگا».

**پێنجەم،** ئەگەر دێر هات، بە سەر خەڵکیدا تێنەپەڕێ. لە هەواڵدا هاتووە ئەوەی وا بکا، لە رۆژی پەسڵاندا، پردێکی لێ چێ دەکەن تا خەڵکی بەسەریدا تێپەڕن. جارێک پێغەمبەر یەکێکی بینی کە وا تێپەڕا. کە لە نوێژ بووەوە، فەرمووی: «بۆ جومعەت نەکرد؟» وتی: «یا رسولەڵلا! دەگەڵ تۆ بووم». فەرمووی: «بینیتم کە چۆن بە سەر خەڵکیدا هەنگاوت دەنا»؛ واتە، ئەوەی بەمجۆرە تێپەڕی، وەکوو ئەوەیە نۆژ[2]ی نەکردبێ. بەڵام ئەگەر ریزی هەوەڵ چۆڵ بێ، رەوایە کە بڕوا تا دەگاتە ریزی بەرەوە؛ چونکە خەتای ئەو کەسانەبووە کە ریزی یەکەمیان چۆڵ هێشتۆتەوە.

**نەریتی شەشەم،** ئەوەیە کە نابێ لە بەر نوێژی کەسێکدا کە خەریکی نوێژ خوێندنە، تێپەڕی. کاتێ دانیشت دەبێ لە ئەستوون یا دیوار نزیک بێ تا کەس نەتوانێ بە بەر نوێژیدا هەنگاو بنێ؛ چونکە لەم کارە نەهی کراوە. لە هەواڵدا هاتووە کە: «مرۆڤ ئەگەر ببێتە خۆڵەمێش و با بە دەشتیدا بوەشێنێ، باشتر لەوەیە لە بەر نوێژی نوێژخوێنێکدا تێپەڕێ».

---

١. نووژەن: بدعت.

٢. نۆژ: نوێژ.

**نەریتی حەوتەم:** ئەوەیە کە بڕواتە ریزی یەکەمەوە؛ ئەگەر جێ نەبوو، تا نزیکتر بێ باشترە و وەدم و خێری زۆرترە؛ مەگەر ئەوەی لە ریزی هەوەڵدا سەربازان بن کە بەرگی دیبایان لە بەرە، یا بەرگی رەشی وتەبێژ، ئاوریشمین بێ یا خۆ شیرەکەی زێڕین بێ، یان هەر شتێکی نەهی لێکراوی تر؛ لەم کاتەدا دەتوانێ دوورتر بێ و ئەمە باشترە؛ چونکە شیاو نییە کەسێک بە ویستی خۆی، لە شوێنێکدا دابنیشێ کە شتی نەهی لێکراوی لێیە.

**نەریتی هەشتەم:** ئەوەیە کە تەنانەت پاش پەیڤی وتەبێژیش نابێ قسە کا و دەبێ خەریکی پەرسڤی بانگی بانگبێژ بێ و پاشان گوێ بۆ وتەکاتی خەتیب راگرێ و ئەگەر کەسێک ویستی شتێک بڵێ، بە ئاماژە -نەک بە زمان- بێدەنگی کا؛ پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی لە کاتی وتاردا بە کەسێکی گوت "وس بە" یان "گوێ راگرە" پەیڤێکی پووچی گوتووە و ئەوەی لەم کاتەدا هیچ و پووچ بڵێ، نوێژی هەینییەکەی بەتاڵە». ئەگەر زۆر دوور بێ و گوێی لەوتەکانیش نەبێ، دەبێ بێدەنگ بێ و لە شوێنێکدا کە قسە دەکەن، دانەنیشێ. لەم ماوەیەدا، نوێژیش نەکا، مەگین نوێژی «**تحیت**»ی مزگەفت[1].

**نۆهەم،** ئەوەی کە نوێژ دەکا، حەوت جار «اَلْحَمْدُ» و حەوت جار «قُلْ هُوَ اللهُ» بخوێنێ و پاشان «معوذتین[2]» بخوێنێ؛ چونکە بێژراوە کە «لەم هەینیەدا یاکوو لە هەینی دواییدا لەمپەرێکە لە هەمبەر شەیتانەوە». بڵێ: «اَللّٰهُمَّ یا غَنِیُّ یا حَمیدُ یا مُبْدیٔ یا مُعیدُ یا رَحیمُ یا وَدودُ أغْنِنی بِحَلالِکَ عَنْ حرامِکَ وَ بِطاعَتِکَ عَنْ مَعْصِیَتِکَ وَ بِفَضْلِکَ عَمَّن سِواک[3]». گوتوویانە: «ئەوەی بەردەوام ئەم دوعایە بخوێنێ، پەروەردگار لە شوێنێکەوە کە چاوەڕوانی نەکردووە، رزق و رۆزی پێ دەگەینێ و لە خەڵکی بێنیازی دەکا». پاش ئەمە، شەش رەکات نوێژ کا -نوێژی سوننەت؛ ئەم رادەیەیان لە پێغەمبەر گێڕاوەتەوە.

**نەریتی دەهەم:** ئەوەی بۆ نوێژێ عەسر لە مزگەفتایە، چاتر وایە تا نوێژی شێوان لە مزگەفت بمێنێتەوە. دەڵێن: «خێری ئەمە وەکوو حەج یان عەمرەیەکە». ئەگەر بۆی نەکرێ و بگەڕێتەوە بۆ ماڵ، دەبێ دڵی یادی خودا کا؛ تا ئەوساتە بە وەدم و هێژایە -کە لە رۆژی هەینیدایە- دەگا، لە خێر و بێری بێبەش نەبێ.

**نەریتەکانی رۆژی هەینی:** دەبێ لەم رۆژەدا ئەم حەوت کاری خێرە بەجێ بێنێ:

---

١. نوێژی «تحیت»ی مزگەفت نوێژێکە کە پاش هاتنە نێو مزگەوت دەخوێنرێ.

٢. سوورەی ١٣ و ١٤ قورئان کە بە «قل أعوذ» دەس پێدەکەن.

٣. ئەی پەروەردگاری بێنیاز و پەسنکراو، ئەی دەسپێکەری دوویات کەرەوە، ئەی دلۆڤان و خۆشەویست! بە رزقی حەڵاڵ لە حەرام، بە گەردەن کەچی لە سەربزێوی و بە وەدم و خێر لە هەرچی بێجگە خۆتە بێنیازم کە.

**یەکەم**: دەبێ بەیانی لە کۆڕی زانستدا ئامادە بێ و لە پەیڤی دنیا دوور بێ؛ لە کۆڕی کەسێکدا دابنیشێ کە قسە و هەڵسوکەوتی، دنەدەری دڵ بەرەو دوارۆژ بێ، نەک بەرەو دونیا. ئەگەر ئاخافتنێ وا نەبێ، ئەو کۆڕە، کۆڕی عیلمی پێ ناڵێن. ئەگەر وابوو، لە هەواڵدا هاتووە کە: « کۆوەبوون لە ئاوەها کۆڕێکدا، خێر و ودمی پتر لە هەزار رەکات نوێژە».

**دووەم**: لەم رۆژەدا کاتەساتێکی پڕخێر و ودمی هەیە، لە هەواڵدا هاتووە کە: «هەرکەس لەم ماوەیەدا نیازێکی بێ، بۆی دێتە دی». زانایان لە سەر ئەوەی کە ئەم کاتە کەیە، رای جۆراوجۆریان هەیە: کاتی خۆرهەڵاتە، یان ئێوارەیە، خۆراوایە، یا خۆ کاتی بانگی بەیانییە، یا کاتی رۆیشتنە سەر مینبەری گوتاربێژە، یا کاتی نوێژ خوێندنە، یا خۆ کاتی نوێژی عەسرە. راستیەکەی ئەوەیە ئەم کاتە بەرپیوارە و کەس بە تەواوی نازانێ کەنگێیە، هەر وەکوو شەوی قەدر؛ بۆیە دەبێ تەواوی رۆژ ئاگادار بێ و لە زیکر و یادی پەروەردگار کلا نەبێ.

**سێهەم**: لەم رۆژەدا دروودی زۆر بنێرێتە سەر مستەفا(د.خ)، پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی لەم رۆژەدا هەشتا سەڵوات و درووودم بۆ بنێرێ، پەروەردگار لە تاوانی هەشتا ساڵی خۆش دەبێ». پرسیاریان کرد: «یا رەسولەڵلا! چۆن درووودت بۆ بنێرین؟» فەرمووی بڵێن: «اَللّهُمَّ صَلِّ عَلی مُحَمَّدٍ وَ عَلَى آلِ مُحَمَّدٍ صَلاةً تَكُونُ لَکَ رِضاءً وَ لِحَقِّهِ أداءً وَ أَعْطِهِ الْوَسيلَةَ وَ الْفَضيلَةَ وَ ابْعَثْهُ الْمَقامَ الْمَحْمُودَ الَّذي وَعَدْتَه، وَ إجْزِهِ عَنّا ما هُوَ وَ أَهْلُهُ وَ إجْزِهُ أَفْضَلَ ما جَزَيْتَ نَبِيّاً عَنْ أُمَّتِهِ وَ صَلِّ عَلَى جَميعِ اخوانِهِ مِنَ النَّبيّينَ وَ الصّالِحينَ، يا أَرْحَمَ الرّاحمين[1]».

دەڵێن: «ئەوەی حەوت هەینی، حەوت جار ئەم دوعایە بخوێنێ، بێگومان پێغەمبەر شەفاعەتی دەخوازێ».

ئەگەر تەنیا: «اَللّهُمَّ صَلِّ عَلی مُحَمَّدٍ وَ عَلَى آلِ مُحَمَّدٍ»یش بڵێ، هەر باشە.

**چوارەم**: ئەوەی لەمرۆژەدا زۆر قورئان بخوێنێ؛ بەتایبەت سوورەی «الكهف»، کە خەبەری زۆری لە سەرە. پیاوچاکانی پێشوونان رۆژانی هەینی هەزار جار «قُلْ هُوَ اللهُ أَحَد»، هەزار جار سەڵەوات و هەزار جار «سُبْحانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ وَ لا الهَ الاّاللهُ وَ اَللهُ أَكْبَر»یان خوێندووە.

**پێنجەم**: ئەوەیە کە لەم رۆژەدا نوێژی زۆرتر کا. لە خەبەردا هاتووە کە: «هەرکەس لە کاتی خۆیا

---

١. پەروەردگار! درووود بنێرە بۆ سەرمحەممەد و یارانی، درووودێک کە خۆت پێت خۆش بێ و شیاوی ئەویش بێ. رێز و بەرزی و پێ بدە، بۆ ئەو پلە و پاگەی -کە بەڵێنت پێدا بوو- هەڵیبژێرە و لە لایەن ئێمەوە پاداشێکی شیاوی پێ بدە، پاداشێک کە داوتە بە سەرترین پێغەمبەرانت لە لایەن پیرەوانیانەوە، درووود بنێرە بۆ سەر هەموو برادەرانی لە نێوان پێغەمبەران و چاکاندا، ئەی دلۆڤانترینی دلۆڤانان.

بڕواتە مزگەفت و چوار ڕەکات نوێژ کا و لە هەر ڕەکاتـدا، پـەنجـا جـار «قُـل هُـوَ اللهُ أحَـد» بخوێنـێ و یەکجاریش سوورەی «ٱلۡحَمۡدُ» لەم جیهانە دەرناچێ، مەگین ئەوەی جێگای لە بەهەشتڕا پێی بیـشان بدرێ، یا خۆ بە هۆی کەسێکیترەوە ئاگادار دەکرێ». لەم ڕۆژەدا موستەحەبە کـە چـوار ڕەکـات نـوێژ بخوێنێ و لەم چوار ڕەکاتەدا سوورەی ئەنعام، کەهف، یاسین و تاها بخوێنێ. ئەگەر پێـی نـەخوێنـدرا، سوورەکانی سوجدە، لوقمان، دوخان و مولک بخوێنێ. ئیبنی عەبباس لـە ڕۆژانی هـەینیـدا بـەردەوام نوێژی تەسبیحی دەخوێند، ئەم نوێژە بە ناوبانگە. باشتر وایە پاش نیوەڕۆ نـوێژ کـا و پاشـان تـا نـوێژی عەسر لە کۆڕی زانستدا بەشدار بێ و لە نوێژی عەسرەوە تاکوو نوێژی شێوان خـەریکـی یـاد و زیکـر و داوای لێبووردن بێ لە پەروەردگار.

**شەشەم:** ڕۆژی هەینی بەبێخێر نەبێ، هەرچەند ئەو خێـرە پاروویـەک نـان بـێ؛ چـون ودمـی زۆرو زەوەندەیە. هەر دەرۆزەیەک کە لە کاتی وتاری وتاربێژدا دەرۆزەیی کا، دەبێ لێی تووڕەبـن و گـەلێـک ناشرین و ناحەزە خێری پێ بدەن.

**حەوتەم:** بە کورتی دەبێ لەم ڕۆژەدا -ڕۆژی هەینی- بیری لە ڕۆژی پەسلان بێ و سـەرتاسـەری ڕۆژ خەریکی خێر و چاکە بێ و خێ نەداتە کـاری دونیـا. ئـەوەی پـەروەردگـار دەفـەرمـێ: «فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ [1]»، ئەنەس دەڵێ: «واتـای ئـەمـە، کـڕین و فـرۆتن و کاری دونیا نییە، بەڵکەم فێربوونی زانستە و سەردانی برادەران و نەخۆشان و هاوڕایی جەنازە و ...».

**پرسێک**

ئەوەی پێویستی نوێژ بوو بێژرا. ئەگەر پرس و کێشەیەکی نوێ هاتە گـۆڕێ، دەبـێ پرسـیار کـەن و لێرەدا جێگای ڕاڤەی زۆرتر لەمەنییە؛ بەڵام وازوازی لە نییەتی نوێژڕا گەلێک زۆرە و لێرەدا ئاماژەیەکـی پێ دەکرێ:

بزانە ئەوەی کە لە نییەتدا تووشی وازوازی دەبێ، یا لە ئاوەزیدا کورتییەکی هەیە، یا خـۆ سـەوداییـە، یان لە شەریعەت نازانێ و لە واتای نییەت نەگەیشتووە؛ چونکە نییەت ئەو تامەزرۆییەیـە کـە تـۆی لـە سەر پێ و ڕوو لە قیبلەوەستاندووە تا فەرمانی پەروەردگار بەجێ بێنی. وەکـوو ئـەوەی یـەکێـک پێـت بڵێ: «فلان زانا هات، هەستە سەر پێ و ڕێزی بگرە». بە خۆت ناڵیی: «نییەتی ئەوەم هەیە هـەسـتمە سەر پێ بۆ ڕێز گرتنی فلان زانا بە بۆنەی وتنی فلان کەسەوە»، کەچی دەمودەس هەڵدەسـتێتە سـەر پێ و ئەم نییەتەش لە ناختدایە، بەبێ ئەوەی بـە دل یـا بـە زمـان بیـڵێی. هـەرچـی بـە دڵ ببێـژرێ

---

[1] قورئان(٦٢/١٠) هەرگا لە نوێژێ بوونەوە، بە هەردیدا بلاو ببن و بۆ چاکەی خودا بکۆشن.(هـ).

ئاخاوتنی دەروونە نەک نییەت؛ چونکە نییەت ئەو مەیل و حەزەیەکە لە دەروونت دێتە دی و هەڵتدەخرێنێ. بەڵام دەبێ بزانی دەستوور چییە: دەبێ بزانی بەجێهێنانی نوێژی نیوەڕۆیە یا خۆ عەسر؛ کە دڵ لەمە ئاگادار بوو، بڵێ «**الله اکبر**»، گەر بێئاگا بوو، دەبی بیهێنیەوە بیری خۆت. پێت وا نەبێ واتای بەجێهێنانی فەرز و نۆژی نیوەڕۆ -بۆ نموونە-بە یەکجاری و بەتەواوی لە دڵترا کۆوە بێ؛ بەڵام چونکە پێک نزیکن، کۆوە دەکرێن؛ هەر ئەوندەش بەسیە. چونکە ئەگەر کەسێک لێت بپرسێ: «فەرزی نوێژی نیوەڕۆ بەجێ دێنی؟» دەڵێی: «ئەرێ». لەو دەمەیڕا کەدەڵێی: «ئەرێ»، سەرجەمی واتاکانت لە دڵایە، نەک بەش بەبەشی. کەواتە پەیڤی تۆ دەگەڵ خۆت -بۆ هێنانەوەبیر- وەکوو وتەی ئەو کەسەیە. «الله اکبر» بە جێی «ئەرێ»یە. سەختگری لەمە زۆرتر دەبێتە هۆی ئاژاوەی نێو دڵ و نوێژ. دەبێ لەمە ئاسان بگری. کە ئەم رادەیەت هێنایە دڵدا -هەرچۆن کە بێ- دڵنیا بە کە تەواوە؛ چونکە نییەتی نوێژ، وەکی نییەتی هەموو کارانیترە. لەم سۆنگەوە بوو کە لە سەردەمی پێغەمبەردا، هیچ یەک لە یارانی، لە نییەتدا وازوازی نەبوون، باش دەیانزانی ئەمە زۆریش گرینگ و دژوار نییە. ئەوەش لەمە نەگەیشتووە، دیارە هیچ لە نوێژ تێنەگەیشتووە.

## بنەمای پێنجەم - زەکات

زەکات، ئەستوونێ لە ئەستوونەکانی موسوڵمانیە، پێغەمبەر فەرمووی: «بنەمای موسوڵمانی پێنجن: پەیڤی «لا الهَ الاّ الله مُحَمَّد رَسُولُ الله[1]، نوێژ، زەکات، رۆژوو و حەج». لە خەبەردا هاتووە کە: «ئەوانەی زێڕ و دراویان هەیە و زەکاتی لێ نادەن، هەریەکی دەبێتە داخێک بە سەر سنگیاندا - بە چەشنێک کە لە پشتەوە دەربێ - لە سەر پشتڕا، بە جۆرێک کە لە سەر سنگەوە بێتە دەر. ئەوەی خێوی چوارپێیە و زەکاتی نادا، رۆژی پەسلان ئەو چوارپێیانەی بە سەردا زاڵ دەبن و دەیدەنە بەر شاخ و دەیخەنە ژێر پێ؛ کە هەموویان بە سەریدا تێپەڕان و شێلایان، ئەوەی پێشەوە دیسان دەگەڕێتەوە و ئەوانیتریش دەدەنە پەی و دەیشێلنەوە؛ تا ئەو کاتەی حسێبی هەموو خەڵکی دەگەڵ بکەن».

ئەم خەبەرە لە هەردوو «سەحیح[2]»دا هاتووە. کەواتە، زانینی ئەوەی کە زەکات چییە و چۆنە، لە سەر هەموو خودانی ماڵوساماندا پێویستە.

### جۆرەکانی زەکات و مەرجەکانی

شەش شت زەکاتی لە سەرە:

**جۆری یەکەم**: **زەکاتی چوارپێ**، ئەوانەش بریتین لە حوشتر و گا و مەڕ. بەڵام ئەسب و ئاژەڵیتر زەکاتیان نییە. ئەم زەکاتە بە چوار مەرج دێتە دی:

**مەرجی یەکەم**: دابەسراو نەبێ، بەڵکوو دەبێ ببرێتە لەوەڕگە، تا گوژمە[3]ی زۆر نەبا. ئەگەر بە درێژایی ساڵ ئەوەندەی لەوەڕ بداتێ کە گوژمەی زۆر بێ، زەکاتی ناکەوێ.

---

[1] - شادە.

[2] - صحیح بخاری و مسلم.

[3] - گوژمە: هزینە.

**مەرجی دووەم:** ئەوەیە کە یەک ساڵ لە ملکی خێوەکەیدا بمێنێتەوە، ئەگەر نەماوە زەکاتی ناکەوێ؛ بەڵام وەچەی ئەو چوارپێیە، هەرچەند لە کۆتایی ساڵیشدا هاتبێتەدونیاوە، زەکاتی لە سەر پێویستە، وەکوو ئەسڵی ماڵەکە.

**مەرجی سێهەم:** دەبێ ئەو ماڵە بە تەواوی لە ژێر دەسەڵاتی خێوەکەیدا بێ و لە سۆنگەی ئەوەوە، دەوڵەمەند بێ. بەڵام ئەگەر بزر بووبێ، یا خۆ دەسەڵاتدارێک بە زۆر لێی ئەستاندبێ، زەکاتی ناکەوێتە سەر ئەم. مەگین ئەوەی نووکوبەدی بە قازانجەوە بداتەوە بە خێوەکەی، ئەوسا زەکاتی رابردووش پێویستە. ئەگەر کەسێک بە قەدەر ماڵوسامانی، قەرزدار بێ، باشتر ئەوەیە زەکاتی لە سەر نەبێ؛ چونکە لە راستیدا هەژار و بەلەنگازە.

**مەرجی چوارەم:** ئەوەی کە «نصاب[1]» بێ و بەو ماڵە دارا بووبێتەوە؛ چونکە کەس بەماڵی کەم دەوڵەمەند نابێتەوە.

بەڵام **حوشتر**؛ تا نەبنە پێنج، هیچ زەکات هەڵناگرن. کە بوونە پێنج، مەڕێک زەکاتیانە و بوونە دە، دوو مەڕ و بوونە پازدە سێ و لە بیستدا، پێنج؛ ئەم مەڕانە لە یەکساڵ کەم نەبن و ئەگەر بزن بوو، لە دوو ساڵ کەم نەبن. کە بوونە بیستوپێنج حوشتر، حوشترێکی یەکساڵەی مێ دەبێتە زەکاتیان. ئەگەر نەیبوو دووساڵەیەکی نێر بەجێی دەدرێتە زەکات. ئەو کات تا نەبنە سیوشەش زەکاتی زۆر نابێ، لە سیوشەشدا حوشترێکی مێی دووساڵە، لە چلوشەشدا مێیەکی سێساڵە و لە نەوەدویەکدا دوو مێی سێساڵە و لە سەدوبیست و یەکدا سێ مێی دووساڵە و پاش ئەمە، لە هەر پەنجا حوشتردا مێیەکی سێساڵان و لە هەر چل حوشتردا مێیەکی دووساڵان زەکاتیە.

بەڵام **گا**: تا نەبنە سی زەکاتیان لە سەر نییە؛ لە سیدا گوێلکێکی یەکساڵەیان زەکاتە. لە چلدا گوێلپارێک، لە شەستدا دوو یەکساڵان، پاش ئەمەحیسابیان دەکەوێتە سەر، واتە: لە هەر چل سەردا دووساڵانێک و لە هەر سی سەردا یەکساڵانێک زەکاتیانە.

**مەڕ**: لە چل مەڕدا، یەک سەر زەکاتی هەیە؛ لە سەدوبیستویەکدا، دوو سەر، دووسەد و یەکدا، سێ سەر، لە چوارسەددا چوار سەر و لەمەو بە دوا حیسابی لە سەرە؛ واتە: لە هەر سەد سەردا، یەک سەر زەکاتی هەیە. ئەو یەک سەرەش نابێ کەمتر لە یەکساڵان بێ؛ ئەگەر نێر بوو، لە دوو ساڵ نابێ کەمتر بێ. ئەگەر دوو کەس مەڕەکانیان ئاوێتەیە و هەردوویان زەکات دەرن -واتە یەکێکیان کافر یان کۆیلەی بە مەرج ئازادکراو نەبێ[2]- هەردوویان یەک زەکات دەدەن؛ وەکوو ئەوەی کە ئەگەر

---

[1] - ئاستێک لە ماڵ و سامان کە زەکاتی لێ بکەوێ.

[2] - کۆیلەیەک کە ئازاد کرابێ بەو مەرجەی کار کا و پارەی ئازاد بوونی خۆی بداتەوە بە خودانی خۆی (مکاتب).

پێکەوە چل سەر مەڕیان هەیە، هەریەکەو نیوە مەڕێکیان لێ دەکەوێ؛ ئەگەر سەد و بیست مەڕیان هەیە، پێکەوە مەڕێک زەکات بدەن[1].

**جۆری دووهەم: زەکاتی دەیەکانە[2]**

ئەگەر کەسێک خاوەنی هەشتسەد مەن گەنم، جۆ، مەویژ، خورما یان هەر شتێکی‌تر کە بە جێی خۆراک بێ و پێخۆری تاقمێک دابین کا، وەکوو نۆک، برینج، باقلە و ... بێ، دە یەکانەیان لە سەر پێویستە. هەرچی خۆراک نەبێ، وەکوو پەموو، گوێز، کەتان و میوەکان، زەکاتی دە یەکانەیان لە سەر نییە. هەروەها ئەگەر چوارسەد مەن گەنم و چوارسەد مەن جۆ بێ، زەکاتی ناکەوێ؛ چونکە لە یەک جۆر نین.

گەر بە جۆگە و کارێز ئاودێری نەکرێ و بە دۆلچە ئاوی بۆ هەڵگوێزرێ، نیوەی دەیەکانە(واتە بیست یەکانە) زەکاتی دەکەوێ. هەروەها نابێ ترێ و خورمای تەڕ بدەنە زەکات، بەڵکوو مێوژ و خورمای ئامادە دەدرێنە زەکات؛ مەگین ئەوەی ترێیەکە مەوێژی لێ چێ نەبێ، ئەوسا ترێ دەدرێتە زەکات. کاتێ ترێ رەنگی گرت و تووی گەنم و جۆکەش سفتەوە بوو، نابێ دەستی تێوەردا، تا بەشی هەژارانی لێ بەراورد کا. پاش ئەوەی بەشی نەدارانی لێ دیاری کرد، ئەوسا ئەگەر دەستی تێوەربدا، رەوایە.

**جۆری سێهەم: زێڕ و زیو**

دووسەت درهەم زیو، پێنج درهەم زەکاتی لە سەرە؛ لە کۆتایی ساڵدا. بیست دراوی زێڕ، نیو دراوێ زێڕی زەکاتە؛ ئەمانە چلیەکانە زەکاتیان دەکەوێ. هەرچەن زۆرتر بێ، زەکاتەکەش هەر بەو چەشنە -واتە: چلیەکانە- زۆر دەبێ. کەڵ و پەلی زیو و کاسە و کویلەی زێڕ و زیو و شیری زێڕین و ئەو شتانەی لە زێڕ و زیو چێ‌کراون و رەوا نین، هەموویان زەکاتیان لە سەرە. بەڵام خەملاتدنێک کە بە زێڕ و زیو بکرێ و ژن یان پیاو بە چەشنێکی رەوا و نەهی لێنەکراو خۆیان پێ بڕازێننەوە، زەکاتی وەبەر ناکەوێ. بەڵام ئەگەر کەسێک زێڕ و زیوی لە لای خەڵک بێ و هەرکات بیهەوێ، بتوانێ وەری‌بگرێتەوە، زەکاتی لە سەرە.

---

[1] - لە «احياء العلوم الدين»دا واهاتووە: تا مەڕ نەگەنە چل سەر زەکاتیان نییە. کە بوونە چل، یان مەڕێک دووساڵان یا بزنێکی سێ‌ساڵان زەکاتیە. لەوە زۆرتر بێ تا دەگاتە سەتوبیست هەر ئەوەیە. لە سەتوبیستو یەکدا، دوو مەڕ و لە دووسەد و یەکدا سێ‌مەڕ، لە چوارسەددا چوار مەڕ دەبێ بدرێتەزەکات. پاش ئەوە حسێبی بۆ رادەگیرێ؛ واتە لە سەتا یەک زەکاتی دوو کەس کە مەڕەکانیان ئاوێتەیە، وەکوو زەکاتی یەک خاوەن ماڵە. ئەگەر دووکەس پێکەوە چل سەریان مەڕ هەیە، یەک مەڕ ئەدەنە زەکات. ئەگەر سێ کەس سەدوبیستویەکیان هەیە، هەر سێکیان مەڕێکیان لە سەرە. (کتێبی زەکات_ ل ١٧٣).

[2] - دەیەکانە: معشرات.

**جۆری چوارەم: زەکاتی مامەڵە و بازرگانی**

کە کەسێک بە قەدەر بیست دینار شتێکی کڕی -بە مەبەستی مامەڵە- و ساڵی بە سەردا هاتەوە، ئەوە زەکاتی دەکەوێ و قازانجی مامەڵەکەش پاش فرۆشران لە نێوان ساڵدا بەراورد دەکرێ و دێتە ئەژمار. لە کۆتایی هەر ساڵدا دەبێ نرخی ماڵەکە دیاری بکرێ: ئەو دەم، ئەگەر سەرمایەسەرەکییەکە زێڕ یا زێو بووبێ، هەر لەوە بیدا؛ ئەگەر بە پارە کڕیبێتی، بەو پارەی کە لە شاردا باوە، بیدا. ئەگەر کالایەکی هەیە و دەیەوێ مامەڵەی پێوە کا، تا شتێکی پێ نەکڕیبێ، ساڵی مامەڵەکەی دەس پێ ناکا. ئەگەر لە نێوانی ساڵدا لە مامەڵە و بازرگانی پاشگەز و پەژیوان بووەوە، زەکاتی لە سەر نییە[1]. بەڵام ئەگەر بیەوێ بە پارە شتێک بکرێ و پارەکەشی لە رادەیەکدا بوو کە زەکاتی وەبەر دەکەوت، لەو دەمەیدا ئەو پارەیە دێتە نێو سامانی، ساڵی زەکاتی دەست پێ دەکا[2].

**جۆری پێنجەم: زەکاتی جێژنی رەمەزان**

هەر موسوڵمانێ کە شەو و رۆژی جێژنی رەمەزان زۆرتر لە خەرجی خۆی و خێزانی هەبێ -بێجگە لە خانی و جلوبەرگ- لە سەریە تا لەوەی کە خۆی و خێزانی دەیخۆن، زەکات بدات. رادەی ئەوەش بریتییە لە دوو مەن و دوو بەش لە سێبەشی مەنێک[3]. ئەگەر لە جێژندا گەنمی خواردبێ، ناتوانێ جۆ بدا. لە هەر جۆرێکی دانەوێڵەی خواردبێ، دەبێ لە باشترین جۆری بدات. بە رای شافعی، ناتوانێ بە جێی گەنم، ئارد و شتیتر بدات. هەرکەس خەرج و نەفەقەی لە سەر تۆیە، سەرفیترەشی لە سەر تۆیە -وەکوو ژن و منداڵ و داک و باب و ...- زەکاتی کۆیلەی هاوبەش، لە سەر هەردوو خودانیەتی. زەکاتی کۆیلەی کافر، پێویست نییە. ئەگەر ئافرەت، لە ماڵی خۆی زەکاتی خۆی بدا، رەوایە. مێردیش بێئێزنی ژن، دەتوانێ سەرفیترەی بدا. ئەم رادەیە لە دەستوورەکانی زەکات، زانینی پێویستە، بێجگە لەمەش پرسێک هاتە گۆڕی دەبێ بپرسرێ.

## چۆنییەتی زەکات دان

دەبێ لە زەکات داندا پێنج شت رابگیرێ:

---

۱. کاتێ پێش تەواو بوونی ساڵ، لە نییەتی مامەڵە پاشگەز بوو، زەکاتی ناکەوێ. (احیاءالعلوم‌الدین. ل۱۷٦).

۲. واتە: ئەگەر پارەی نەختت بێ (نەک کالا) و نییەتی مامەڵەی لێ بێنی، هەوەڵی ساڵی زەکات، لە رۆژی کڕینی شتو مەکەوە دەس پێ ناکا، بەڵکوو لەو رۆژەوە ئەو پارەیە هاتۆتە نێو سامانی دەس پێ دەکا. هەر چەند دیرتر کالاکە بکرێ. (وەرگێڕدراوی «احیاء»).

۳. ۲و ۲/۳ مەن.

**جۆری یەکەم:** نییەتی زەکاتی فەرز بێنێ؛ ئەگەر بریکارێکی دانا، دەبێ پێی رابسپێری تا لە کاتی زەکاتداندا نییەتی زەکاتی فەرز بێنێ. کە سەرپەرشتێ ویستی زەکاتی ماڵی سێوی بدا، دەبێ نییەت بێنێ.

**جۆری دووەم:** کە ساڵی ماڵەکەی هاتەوە، لە زەکات داندا پەلە بکا؛ چونکە بڕ و بیانوو بۆ دوا کەوتنی زەکات هیچ پارە ناکا. زەکاتی سەرفیترە، نابێ لە رۆژی جێژن تێپەڕێ. پەلە لە مانگی رەمەزان، رەوایە، بەڵام بەر لە رەمەزان شیاو نییە. بلەز[1] بوون لە دانی زەکاتی ماڵوسامانلە نێو ساڵدا رەوایە، بەو مەرجەی زەکات وەرگر، تا کۆتایی ساڵ هەژار و بەلەنگاز بمێنێتەوە. گەر پێش دوایی هاتنی ساڵی زەکات، کابرا بمرێ یا دەوڵەمەندەوە بێ یا خۆ لە دین وەرگەڕێ، دەبێ جارێکیتر زەکات بدرێتەوە.

**جۆری سێهەم:** زەکاتی هەر شتێک لە هەمان شت بدات. بە پێی بۆچوونی شافعی ناتوانێ زێڕ لە هەمبەر زیو، گەنم بە جێی جۆ، یا خۆ شتێک بە جێی شتێکیتر -هەرچەن بە هەمان نرخ- بدات.

**جۆری چوارەم:** دەبێ هەر لەو شوێنەی کە ماڵوسامانەکەی تێدایە، زەکات بدات؛ چونکە هەژارانی ئەوێ چاوەنۆڕی زەکاتی وین. ئەگەر زەکات لە باژێڕێکیتردا بدات، راستیەکەی ئەوەیە کە هێشتا زەکاتی لە سەر نەکەوتووە.

**جۆری پێنجەم:** دەبێ زەکات لە نێوان هەشتتاقمدا دابەش بکرێ، هەریەک لەم تاقمانە نابێ کەمتر لە سێ کەس بن، سەرجەم ببێتە بیست و چوار کەس. بە گوێرەی شافعی، ئەگەر تەنانەت زەکاتەکە یەک درهەم بێ، دەبێ بکرێتە هەشت پاژەوە. پاشان هەر بەشێک لە نێوان سێکەس لە هەرتاقمێکدا دابەش بکرێ، کەم و زۆر بوونی گرینگ نییە. سێتاقم لەوانەی بێژران، زەکاتی کەمتر وەردەگرن:

خەزاکەران، نۆ موسوڵمانان و کۆکەرەوەی زەکات؛ بەڵام هەژار و بەلەنگاز[2] و کۆیلەی بە مەرج ئازادکراو[3] زۆرتر وەردەگرن. کە واتە بە پێی پەیڤی شافعی، نابێ کەمتر لە پانزدە کەس لە زەکات بەش ببەن. لە مەزهەبی شافعیدا دوو شت دژوارە: یەکەم: کەس بەجێی کەس نابێ و دووهەم ئەوەیکە دەبێ بکەوێتە بەر هەموانەوە. زۆربەی خەڵکی لەم دووبابەتە پێڕەوی پەیڤی ئەبووحەنیفە دەکەن. هیواداریین کە بەم بۆنەوە گوناحبار نەبووبێتن.

## راڤەی ئەم هەشت تاقمە

**تاقمی یەکەم** بەلەنگازان. کەسێکە کە هیچی نەبێ و نەتوانێ هیچ کارێک بکا. ئەگەر خواردنی

---

١ - بلەز: پەلە.

٢ - بەلەنگاز: بەستەزمان، بێچارە.

٣ - مکاتب: ل ١٢٨ پ ١.

ڕۆژانەی هەبێ و جل و بەرگیشی لە بەردا بێ بەلەنگاز نییە. ئەوەی خواردنەکەی نیوەچڵە و بەرگەکەشی نیوە و ناتواوە، بەلەنگازە. ئەگەر ئیش و کاری بە کەل و پەلێکەوە بەڕێوە دەڕوا و ئەو کەل و پەلەی نییە، دیسان بەلەنگازە. گەر خوێندکار بێ و بە پەرژینە سەر ئیش و کار، لە خوێندن بمێنێتەوە، ئەوەش بەلەنگازە. بەم بەلەنگازانە کەمتر دەگا، مەگین زاڕۆکان: باشتر وایە بەلەنگازێکی خێزانبار ببینێتەوە و بەشی بەلەنگازان بە بۆنەی منداڵەکانیانەوە بداتێ.

**دووەم،** هەژاران. ئەوکەسەیە کە خەرجی لە داهاتی پتر بێ، هەرچەندە خێوی خانی و جل و بەرگ بێ؛ بەلام چونکە خەرجی یەکسالی نییە و کارەکەشی قەرەوی خەرجی ناکا و لە هات و نەهاتایە، ئەوەندەی دەبێ بدرێتێ کە یەکسالی پێوە رابووری. ئەگەرچیبە خاوەنی رایەخ و کەلوپەل و قوماشی خانوو بێ، چونکە پێویستی پییەتی، هەژارە. بەلام ئەگەر شتێک پتر لە نیازی هەیە، هەژار نییە.

**سێهەم،** ئەوکەسانەی زەکات کۆوە دەکەن و دەیدەنەبەلەنگاز و هەژاران. مزی ئەمانە لە زەکات بدرێ.

**چوارەم،** نەو موسوڵمانان. بریتییە لە کابرایەکی دارا کە بووبێتە موسوڵمان. شتێکی بدەنێ، تا کەسانیتر دنە بدرێن بۆ موسوڵمانی.

**پێنجەم،** کۆیلەی بە مەرج ئازادکراو. کۆیلەیەکە کە رزگاری خۆی کڕیوە و پارەی رزگار بوونی دەبێ بداتە خودانی.

**شەشەم،** قەرزارێکە کە قەرزەکەی لە سۆنگەی گوناحەوە تووش نەهاتبێ، ئەو کەسە هەژارە. ڕەنگە دەوڵەمەند بێ. بەلام بۆ دامراندنی نەهامەتی و ئاژاوەیەک تووشی قەرز هاتبێ.

**حەوتەم،** خەزاکەرانێک کە پارەلە حکوومەت وەرناگرن؛ ڕەنگە دەوڵەمەند بن، بەلام خەرجی ڕێگایان ئەبێ لە زەکات بدرێ.

**هەشتەم.** مسافرێک کە توێشووی ڕیگای نەبێ -ڕێبواریٚ بێ یان کەسێک کە لە زێدی خۆی دوور کەوتبێ- بە قەدەر توێشووی ڕێگا پێی بدرێ. هەرکەس گوتی من بەلەنگاز یان هەژارم، دەبێ پەیڤی بەڕاست بزانرێ، چونکە ئاشکرا و خویان نییە پەیڤی درۆ بێ. بەلام مسافر و شەرکەر، ئەگەر سەفەر نەکەن و نەڕۆنە شەڕ، زەکاتیان پێ نادرێ. کەچی تاقمەکانیتر دەبێ بە گوێرەی قسەی بڕوا پێکراوان دیاری بکرێن.

### نهێنییەکانی زەکات دان

باش بزانە، هەر وەکوو چۆن نوێژ ڕواڵەتێکی بوو و ڕاستەقینەیەک، کە ڕۆحی ڕواڵەتەکە بوو،

زەکاتیش وایە. ئەوەی لە نهێنی و راستەقینەی زەکات نەگا، بێجگە لە روالـەتێکی بـێ‌گیـان هیچـی دەست ناکەوێ.

نهێنی زەکات، سێ شتە:

**نهێنیێ یەکەم،** خەلکی فرمان دراون بۆ گەیشتن بە خۆشەویستی خودانی خۆیان؛ ئەوەی وا بیر نەکاتەوە، بڕوادار نییە؛ تەنانەت فەرمان دراون بگەن بەو خۆشەویستیەی کە کەسی‌تریان پتر لە پەروەردگار خۆش نەوێ. هەر وەکوو لە قورئاندا هاتووە کە: «قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ [1]». هیچ بڕوادار نییە ئەوەی نەلێ خودام لە هەموو شت خۆشتر دەوێ؛ پێشی وابێ کە وایە. بۆیە بۆ سەلماندنی ئەم راستیە دەبێ هەرکەس بەلگەیەک بێنێ، تا بە پەیڤی پووچ و بۆش لە خۆبایی نەبێ. ماڵ‌وسامان یەکێک لە خۆشەویستانی مرۆیە، بەوەیان تاقی کردەوە و گوتیان: «ئەگەر راسبێژی لە خۆشەویستیدا، ئەم گراوەت بکە قوربانی تا ئاستی خۆت بناسی لە خۆشەویستی پەروەرندەتدا».

ئەوانەی لەم نهێنییە گەیشتن، بوونە سێ‌چین:

**چینی یەکەم،** راستانن[2]، ئەمانـەی نـووک و بـەدی مـاڵ‌وسـامانیان کـردە قوربـان و گوتیـان: «لـە دووسەت درەم، پێنج درهەم بە زەکات دان، پیشەو کاری چاو نـەزێرانـە[3]، لـە سـەرمانـە هـەرچیمـان هەیە. بەختی کەین لە رێی خۆشەویستی پەروەردگاردا». تاقمێ نیوەی سامانیان دا. ئەبووبەکـر سـەر لە بەری ماڵی هێنا. پێغەمبەر فەرمووی: «چیت بۆ خێزانەکەت دانا؟» گـوتی: «خـودا و پێغـەمبـەری خودا». عومەر نیوەی سامانی هێنا. فەرمووی: «چیـت بـۆ خێزانـەکـەت دانـا؟» گـوتی: «ئـەوەنـدەی هێناومە، دامناوە». پێغەمبەر فەرمووی: «بَيْنَكُما مابَيْنَ كَلِمَتَيْكُمـا»؛ واتـە، جیـاوازی و ئاسـتی ئـەنگـۆ لـە رادەی پەیڤی ئێوەیە.

**چینی دووەم:** مێرخاسانن. ئەمانە ناوێرن بە ئێجگاری نووک و بەدی سامانیان خـەرج کـەن، بـەلام سامانیان رادەگرت و هەرکات هەژارێک رووی لێ دەخستن، لـە یارمـەتی بـەلـەنگـازان رانـەدەمـان و

---

١. (قورئان، ٢٤/٩) بێژە: ئەگەر باب و کوڕ و برا و ژن و خزمەکانوو ئەو ماڵەی پەیداو کردووە و کەل و پەلی بازرگـانی -کـە دەترسـن لەبرەو کەوێ- خانووبەرەی رند و دڵخۆشکەرەی خۆتان، پێ لە خودا و پێغەمبەر و خەزا کردن لە رێی خوادا گرینگترە، چاوەنۆڕ بن تـا فەرمان لە خوداوە دێ. ئەوانەی لە رێ لادەرن، خودا شارەزایان ناکا. (هـ).

٢. راستان: صدیقین.

٣. چاونەزێر: بخیل.

خۆیان دەگەڵ هەژاران بەرانبەر دەزانی. تەنیا بە رادەی دیاریکراوی زەکات قنیاتیان نەدەکرد و گەلێک زۆرتر لەوەیان دەدایە نەداران و کە پێیان دەگەیشتن، هەر وەکی خێزانی خۆیان سەیریان دەکردن.

**چینی سێهەم** پیاوچاکانن. ئەمانە ناوێرن زۆرتر لەوەی کە شەرع دایناوە، بدەن، واتە لە دووسەت درهەم، زۆرتر لە پێنج درهەم نادەن. دەستووری پەروەردگاریان بەجێ هێناوە و دڵخۆشن کە لە فەرمانی لایان نەداوە. هەروەها بە سەر هەژاراندا منەتی زەکات نانن و ئەمەش دوایین ئاستە؛ چونکە ئەوەی کە دڵی دەرفەتی پێ نەدا لە دووسەت درهەمێک کە خودا پێی داوە، پێنج درهەم بداتە نەداران، لە خۆشەویستی پەروەردگار، هیچی بەر نەکەوتووە؛ کە لەو پێنج درهەمەش زۆرتر نەدا، دۆستییەکەی گەلێک لاوازە و لە ریزی رژد و چرووکانە.

**نهێنیێ دووهەم**- پاراوکردنی دڵە لە چاونەزیری و پیسی؛ چرووکی وەکوو پیساییەکە بۆ دڵ کە دەبێتە هۆی ناشیاوی دڵ لە خزمەت پەروەردگار، وەکوو پیس و پوخڵی رواڵەت، دەبێتەهۆی ناحەزی جەستەی مرۆ لە کاتی نوێژدا. ناپاکی رژدی ناسڕێتەوە، مەگین بە خەرجکردنی سامان. زەکات وەکوو ئاوێکی پاک و خاوێن -کە پیسایی دەشوا- چەپەڵی و بەخیلی لە دڵ و دەروون پاک دەکاتەوە. لەم سۆنگەوە دانی زەکات و خێرات بە پێغەمبەر و بنەماڵەی حەرامە؛ چونکە شان‌وشکۆی گەلێک لەوە سەرترە کە چڵک و پیسایی ماڵ‌وسامانی خەڵکی توخنیان کەوێ.

**نهێنیی سێهەم**- شوکرانەبژێری چاکەیە، چونکە سامان چاکەیەکە دەگەڵ بڕوادار کراوە بۆ هێمنی دونیا و دوارۆژی. هەر وەکوو چۆن نوێژ و رۆژوو و حەج، شوکرانەی چاکەی لەشن، زەکات شوکرانەی چاکەی ماڵ‌وسامانە؛ تا ئەوەی کە خۆی بێ‌نیاز بینی و موسوڵمانێکی وەک خۆی دی داماو و نەدارە، بە خۆی بڵێ: «ئەویش وەک من بەندەی خوایە. لە شوکرانەی ئەوەی کە منی لەو بێ‌نیاز و ئەوەی نیازمەندی من کرد، با چاکەیەکی دەگەڵ کەم، نەکوا تاقی کردنەوەیەک بێ و کۆتاییەک کەم و من چەشنی ئەو هەژار بم و ئەو وەکوو من بێ‌نیاز».

هەمووان دەبێ شارەزای ئەم نهێنیانەی زەکات بن، تا عیبادەتیان بە دانی زەکات، توێکڵێکی بێ‌کاکڵ نەبێ.

## نەریت و وردەکارییەکانی زەکات دان

ئەگەر کەسێک بیەوێ عیبادەتی زیندوو بێ و لە رووح و گیان بێوەر نەبێ و خێری چاکەی زۆرتر بێ، دەبێ ئەم حەوت ئەرکە بەرێوە با:

**ئەرکی یەکەم:** بلەز بێ لە دانی زەکات و بەر لە دوایی هاتنی ساڵ و فـەرزبـوونی زەکـات، هـەمـووی دابێ. بەم کارەی سێقازانجی دەگاتێ:

**یەکەم:** ئارەزووی عیبادەتی لە دەروونیدا پتر دەبێ؛ چونکە زەکات پـاش سـاڵ هاتنـەوەی، پێویـستە بدرێ و نەدانی گوناحە. بۆیە لەو کاتە، دانی لە ترسە، نەک خۆشەویستی و عیبادەتێ کە لـە سـۆنگەی ترسەوە دەبێ، نە دۆستی و دلۆڤانی و خۆشەویستی.

**دووەم:** دڵی هەژاران و نەداران دەگەشێتەوە و دەکەوێتە بەر دوعا و نزای خێریـان. دۆعـای نـەداران شوورە و پەرژینێکە لە دەرد و نەهامەتی.

**سێیەم:** لە کۆسپ و چەڵەمەکانی رۆژگار بێوەی دەبێ، چونکە لە دواخستنی زەکات، بـەڵا و ئـاپۆر و تەگەرە ساز دەبێ و دەبێتە کۆسپێک و لەم خێرانە بێبەش دەبێ. کە لـە دڵـدا پاپـا[1]ی شـتێک دێتـە دی، دەبێ بە هەل و دەرفەتێکی چاک بزانرێ، چونکە ئـەوە لا کردنـەوە و سـەرنجـی پـەروەردگـارە و رەنگە شەیتان بە خێرایی خۆی تێ بکوتێ و تەگەرەی تێ خا: «فَإِنَّ قَلْبَ الْمُؤْمِنَ بَيْنَ إِصْبَعَيْنَ مِـنْ أَصَـابِعَ الرَّحْمنِ[2]». یەکێک لە چاکان[3] لە کاتی تارەتدا کەوتە دڵی کراسەکەی بداتە نەدارێک. مریـدێکی بانـگ کرد و گجیەکەی داکەند و پێیدا. مورید گوتی: «گەورەم! بۆچ نـەوەسـتای تـا بێیـە دەرێ؟» گـوتی: «ترسام بیرێکیترم بە دڵدا بێ و لەم کارەم بپرینگێنێتەوە».

**ئەرکی دووهـەم:** ئەوەیە کە ئەگەر بیەوێ بە تەواوی زەکاتەکە بدات، یا لـە مـانگی موحـەڕڕەم بیـدا - کە سەرەتای ساڵە - یا مانگی رەمەزان. چونکە کات هـەرچـەنـد بـەودمتـر بـێ، خێـر و بێـری زۆر و زەوەندترە. پێغەمبەر(د.خ) دەهندەترین و دلاواترینی خەڵکان بـوو، هـەرچـی هـەبـوو، دەیبـەخـشا و مانگی رەمەزان هیچ شتی بۆ خۆی رانەدەگرت و نووک و بەدی خەرج دەکرد.

**ئەرکی سێهەم:** ئەوەیە کە زەکات بە نهێنی و دوور لە چاوی خەڵکی بدات، تا لـە مـەرایی بـە دوور و لە دڵپاکی نزیکتر بێ. لە خەبـەردا هـاتووە کـە: «سـەدەقەی سـەر، تـووڕەیی خـودا دادەمرکێنـێ». هەمیسان لە خەبەردا هاتووە کە: «سبەینێ حەوت کەس لە سای عەرشی خـودان: یـەکیان، ئیمـامی دادگەرە و یەکیان ئەو کەسەیە سەدەقەیەک بە دەستی راست دەدا و دەستی چەپی پێی نازانـێ. جـا بڕوانە کە ئەم کارە چ ئاستێکی بەرزی هەیە کە دەگەڵ ئیمامی دادگەر هاوشانە».

لە خەبەردا هاتووە کە: «ئەوەی بە نهێنی خێر بکا، کاری لە نێوکارە نهێنییەکاندا دەنووسـن، ئەگـەر

---

[1] - پاپا: تاسە، رغبت.

[2] - دڵی برواداران لەنێوان دوو قامک لە قامکەکانی خودای دەهندەیە.

[3] - ئەو مرۆڤە برِوادار و گەورەیە شێخ ئەبووسەعیدی ئەبولخەیر بووە.

بە راشکاوی خێرات کا، لە کردەوە ئاشکراکاندا دەینووسن، ئەگەر لەلای خەڵکی باسی خێراتی خۆی کا، لە ریزی ئاشکرا و نهێنی دەسڕێتەوە و لە ریزی چاوە و دوو روویدا دەنوسرێ». بەم بۆنەوە پێشوونان لە شاردنەوەی خێراتیاندا ئەوەندە بە نهێنی جووڵانەتەوە، تەنانەت کاتێ خێرێکیان بە بەلەنگازێکی بێچاو داوە، ورتەیان لێ نەهاتووە، تا کابرا دەنگیان نەناسێ. یا زۆر بوونە ئەو کەسانەی هەژاری نووستویان دەیوەتەوەو خێریان لە نێو بەرگی ناوە و رۆیشتن تا کاتێ بەخەبەر دەبێتەوە، نەزانێ کێ وای کردووە. زۆریش بوونە، پارەیان خستۆتە سەر رێگای نەدار، یاخۆ داویانە بە کەسیتر بیداتێ.

ئەم هەمووەیان بۆیە کردووە، هەژار پێیان نەزانێ. بەڵام شاردنەوە لە خەڵکیتر لایان گرینگتر بووە، چونکە دەیانگوت گەر ئەم نهێنییە ئاشکرا بێ، دووڕوویی لە دەروون دێتە دی؛ ئەم دانستانە بە گشتی کوشندەی دڵن -بەڵام چاونەزێری لە قەبردا وەک دووپشکە و چاوەش وەکوو مار، کە بەهێزتر لە دووپشکە؛ دووپشک دەکرێتە خۆراکی مار، تا بەهێز و دەستوبردتر بێ- لە کوشندەیەک رەستووە و بە کوشندەیەکی ئەستەمتر تووش هاتووە.

برینی ئەم دانستانە بەسەر دڵدا -پاش رۆچوون لە نێو قەبرا- وەکی برینی دووپشک و مارە، هەر وەک لەسەردێڕی موسوڵمانیدا لەسەری ئاخاوتین. کەواتە زیانی ئەوەی بە راشکاوی خێر بداتە هەژاران، لە قازانجی گەلێک زۆرترە.

**ئەرکی چوارەم** -ئەوەی لە هەرچی دووڕوویییە پاکژ کرابێ و بزانێ سەدەقە و خێر بە ئاشکرادان، دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی چاوی لێ بنۆڕن و بدەنەپەی و ئەوانیش کاری لەو چەشنە کەن. خێر و ودمی بە ئاشکرا سەدەقەدانی ئەو کەسە، گەلێک زۆر و زەوەندەیە. ئەم کەسە دەبێ پێیا هەڵدان و تووک و نزای لە لا وەک یەک بێ و لە هەموو کاردا زانینی پەروەردگاری بۆ بەس بێ.

**ئەرکی پێنجەم**- ئەوەیە کە سەدەقە و خێر بە منەت نان و ئازاردان بە فێڕو نەدات. خوا فەرمووی: لاتُبطِلوا صَدَقاتِکُم بِالمَنِّ وَ الأذی». مەبەست لە «اذی» ئازاردان و رەنجاندنی هەژار و بەلەنگازە بە هۆی ناوچاوگرژی و سێگرمە هێنانەیەک و بە مۆنی قسە کردن لە گەڵ نەداران بە بۆنەی نەداری و دەرۆزەییەوە سووک کردن و بە لووت بەرزی سەیری کردن. هۆی ئەمەش دوو جۆرە نەزانی و گەوجییە: یەکێک ئەوەیە کە ماڵ لە دەستدانی پێ گرانە، لەم سۆنگەوە بە رووشی و هەڵچوویی قسە دەکا. هەرکە لەلای گران بێ دەرهەمێ بدا و هەزار وەربگرێ، نەزانە؛ بەو پارەیە بەهەشتی کڕیوە و خودای رازی کردووە و خۆی لە ئازاری دۆزەخ دەرباز کردووە: بۆچی لەلای گرانە، ئەگەر ئەمەیە

بروای؟

گەوجی دووهەم ئەوەیە پێی وابێ خودا سەرتری و ودمی پێ داوە بە دەوڵەمەندی، جا نازانێ ئەوە خێر و ودمی پێدراوە و سەرتر و هێژاترە کە پانسەد ساڵ پێش ئەو دەرواتە نێو بەهەشتەوە. لەلای خودای دەهندە و دلۆڤان، گەورەیی و هێژایی لە هەژاریدایە نەک دەوڵەمەندی. شەرەف و گەورەیی هەژار لەم دونیایە لەوەدایە کە دەوڵەمەند لەم دونیایە رەنجی کار و گرانی باری دونیای وەئەستۆیە و پەرژاوەتە سەری و بەشی هەژار لەو هەمووە پتر لە نیازی نییە و لەسەر دەوڵەمەند پێویستە بە قەدەر نیازی هەژار لە ماڵوسامانی پێی بدا. کەواتە لە راستیدا دەوڵەمەند لە ژێر رکێفی هەژارە و بۆ پەرای هەژار دانراوە لەم جیهانە و لە دونیاش پانسەد ساڵ چاوەنۆڕی کردۆتە بەشی.

**ئەرکی شەشەم**- ئەوەیە کە منەت نەنێ. بنەمای منەتنان نەزانییە و دانستەی دڵە. ئەوەش بریتییە لەوەی چاکەی دەگەڵ هەژارێ کردووە و لە ماڵی خۆی خێرێکی داوەتێ و هەژاری کردۆتە ژێر دەستی خۆی. کە وای بیر کردەوە، چاوەڕوانە ئەو هەژارە پەرای[1] ئەو بکا و کارەکانی جێبەجێ بکا و لە پێشیدا راوەستێ و سڵاوی لێ بکا. بە کورتی چاوەڕوانی، چاکەی زۆرترە. ئەگەر خراپەیەکی دەگەڵ کا، زۆر سەری سووڕ دەمێنێ کە چاکەی کردووە و ئەو بە خراپە وەڵامی داوەتەوە. رەنگە بڵێ: «من وا چاکەم لەگەڵی کرد». هۆی ئەمەش نەزانینە. راستییەکەی ئەوەیە کە ئەوە ئەو هەژارە بووە کە چاکەی لەگەڵ کردووە و خێرەکەی لێ وەرگرتووە و لە ئاوری دۆزەخی پاراستووە و چرووکی و بەخیلی لە دڵ تاراندووە. ئایا گەر حەجامەتکێشێ بە خۆڕایی خوێنی لێ بگرێ و حەجامەتی کا، منەتی بەسەردا دەنێ بۆ ئەو خوێنەی –کە هۆی نەخۆشی و فەوتانی بووە– بە خۆڕایی پێی داوە؟ چرووکی دڵ و ماڵی زەکات، کە نەدرابێ بە خاوەنی، هۆی فەوتان و پیسایی وییە؛ کەواتە، چونکە بە هۆی هەژارانەوە هەم خاوێن و باکژ بووە و هەمیش لە فەوتان رزگاری بووە، دەبێ منەتی بەسەردا نەنێ.

هەروەها پێغەمبەر فەرمووی: «سەدەقە سەرەتا دەگاتە دەستی بە ودمی پەروەردگار، پاشان دەستی هەژار». چونکە دەیداتە پەروەردگار و هەژار وەکوو بریکاری خودایە و ئەو خێرەی لێ وەردەگرێ، دەبێ خۆی بە منەتباری بزانێ، نەک منەتی بەسەردا بنێ. هەروەها کە لەو سێ نهێنییەی لە نهێنیەکانی زەکات گەیشت و تێیدا راما پێی دەگا کە هۆی منەتنان، نەزانییە. بۆ دووری لە منەتنان، پێشوونان زۆریان هان داوە و لە بەرانبەر هەژاراندا بە خاکەساری و رێزەوە راوەستاون. خێری خۆیان پێ داوە و تکایان لێی کردووە لێیان وەربگرێ. تاقمێک پارەیان لە نێو لەپ ناوە و

---

١- پەرا: خزمەت.

دەستیان لە پێش هەژار راکێشاوە تا خۆیٚ هەڵیبگریٚ و دەستی سەرتر لە دەستی ئەمان بیٚ؛ چونکە: «اَلْیَدُ الْعُلْیا خَیْرٌ مِنَ الْیَدِالسُّفْلَی[1]»، شیاوی کەسێکە کە منەت بەسەر کەسدا نەنیٚ. عایشە و ئوموسەلمەمە، خێرێکیان نارد بۆ هەژارێک و گوتیان: «لەبیرت بمێنیٚ چ نزایەکی بەخێر دەکا». بۆ ئەوەی پەرسڤی هەر نزایەک وەک خۆی بدەنەوە و خێرەکەیان بیٚخەوش بمێنێتەوە و چاوەنۆڕی دوعای بەخێریشیان لە هەژار نەکردووە، تا ئەو بیرەیان بە دڵدا تێنەپەڕیٚ کە: چاکەکەیان کردووە. لە راستیدا چاکەکار، هەژارە کەئەم خێرەی وەرگرتووە.

**ئەرکی حەوتەم**- ئەوەیە کە خاوێنترین و حەلالترین بەشی سامانی بکاتە خێرات؛ ئەوەی لێلییەک لە حەلال بوونی بیٚ، ئاوڕی خێری لیٚ نادرێتەوە، چونکە پەروەردگار خۆی پاکە و بێجگە لە پاکی ناویٚ. خوای مەزن فەرمووی: وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِ[2]؛ واتە: ئەو شتەی کە گەر بە خۆتانی بدەن، بێزتان لیٚ دیٚ، چۆن بۆ خودای خەرج دەکەن؟ ئەو کەسەی کە لە خراپترینی ئەو شتەی هەیەتی بکاتە خێری هەژار، سووکایەتی پێکردووە. چۆن دەبیٚ کە خراپترین بە خودا بدەن و چاترین بۆ بەندە بهێڵنەوە؟ خراپترین ئەو شتەیە کە بە نابەدڵی بدریٚ و هەر سەدەقەیەک کە بە دڵخۆشیەوە نەدریٚ، بەدەگمەن لە لایەن خوداوە پەسند بکریٚ. پێغەمبەر فەرمووی: «رەنگە خێرێکی یەک درهەمی، لە هەزار درهەم پێشتر کەویٚ، ئەوەش ئەو خێرەیە کە لە پاکترین بەشی سامان بیٚ و بە دڵخۆشییەوە بدریٚ.

### شێوەکانی دیتنەوەی هەژاران

ئەوە بزانە کە زەکاتت دایە هەر هەژارێکی موسوڵمان، فەرزت لە کۆڵ کەوتووە؛ بەلام ئەوەی بیەویٚ مامەڵەی رۆژی پەسلان کا، نابیٚ خۆی لە رەنجی زۆرتر بۆ دیتنەوەی هەژارترینەکان لابدا. چونکە خێر، گەر لە جێگەی خۆی و بە کەسی خۆیٚ بدریٚ، ودمی زۆرو زەوەندترە. بۆیە دەبیٚ ئەو کەسەی زەکاتی پێدەدریٚ لانی کەم یەکێک لەم تایبەتمەندییانەی بیٚ:

**دانستەی یەکەم**- ئەو کەسە پارێزکار و لە خواترس بیٚ، پێغەمبەر فەرمووی: «اَطْعِمُوا طَعامَكُمُ الأتْقِیاءَ». واتە: نان بدەنە پارێزکاران. چونکە ئەمانە ئەو شتەی بەدەستی دێنن، لە رێی بەندەگی خوادا کەڵکی لیٚدەگرن. هەروەها ئەو کەسەش کە خێریان دەداتیٚ، لە عیبادەتیاندا هاوبەشە.

یەکێک لە گەورەکان، زەکاتی خۆی بە تەنیا دەدایە سۆفییەکان و دەیگوت: «ئەمانە کەسانێکن کە

---

١- دەستی سەروو، چاتر لە دەستی نزمە.

٢ - قورئان؛ ٢٦٧/٢ نەک لە شتیٚ هێندە چرووک کە بۆ خۆشتان ئەگەر چاوپۆشی لیٚ نەکەن. (هـ)

بێجگە لە خوا هیچیان ناوێ. ئەگەر نیازێکیان بێ، بیریـان دەشـلەژێ. منـیش خزمـەتی دڵـێک کـە بیری لە لای خودا بێ پێمخۆشترە تا یاریدەی سەد دڵـی گـیرۆدەی دونیـا». ئـەم پەیـڤەیان لـەلای جونەید گێڕاوەتەوە و ئەویش گوتوویە:«ئەمە گوتـەی یارێـک لـە یـارانی خودایـە». دەڵـێن پیـاوێکی دووکاندار هەژار کەوت؛ چونکە هەرچی بـوو لـەڕێی خـوا بـەختی کـرد و کـە سـۆفی و پیـاوی خـودا دەچوونە لای، هەرچیان پێویست بایە بە خۆڕایی دەیدانێ. جونەید، پارەیەکی بۆ نـارد تـا بـەو پارەیـە مامەڵەی دەس پێ کاتەوە و گوتی: «مامەڵە بۆ پیاوێکی وەک تۆ زیانی نییە».

**دانستەی دووەم**: ئەو کەسەی خەریکی زانست بێ و بە سەدەقە و خێرێک ئاسوودە بـێ و بپەژێتـە سەر زانست؛ سەدەقەدەریش لە خێری زانستیدا بەشدار دەبێ.

**دانستەی سێهەم**: ئەوەی کە نەداری و هەژاری خۆی شاردۆتەوە و بە رێزو هێژاییەوە دەژی: يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ[1] ئەم تاقمەن کە پەردەی گەورەییان بە سەرخۆ داوە. نە وەکوو ئەو نەدارانەی کە لە پارسەکی شەرم ناکەن.

**دانستەی چوارەم**: ئەو کەسەی خێزانبار بێ یـا خـۆ نـەخۆش و پەککەوتـە بـێ، هەرچەنـد رەنـج و ئاتاجی پتر بێ، خێر و بێریشی زۆرترە.

**دانستەی پێنجەم**: ئەوەی کە لە خزمان بێ. چونکە هەم خزمنەوازییە و هەمیش خێـر و چاکـەیـە. ئەو کەسەش کە لە سۆنگەی خۆشەویستی پەروەردگارەوە وەک برابن، لە رادەی خزمو کریڤە[2].

ئەگەر کەسێکی دیبەوە کـە هـەموو یـاخۆ بەشـی زۆری ئـەم دانـستانەی هـەبوو، ئـەوە پێـشتر لـە هەمووانە. ئەگەر یەکێک توانی خێر و چاکەی بگەیەنێتە دەستی ئەم کەسانە، دوعا و نـزای بـەخێریان، وەک شوورەیەک دەیپارێزێ. ئەم کەڵک و قازانجە بێجگە لەوەیە کـە خـۆی لـە رژدی و چاونـەزێری دەرباز کردووە و شوکرانەبژێری خوای کردووە.

## ئەرێتی وەرگری زەکات

وەرگری زەکات پێنج ئەرکی لە ئەستۆیە:

**ئەرکی یەکەم**: دەبێ بزانێ کە پەروەردگار بەهۆی نەداری هەندێک لە بەندەکانیـەوە، مـاڵوسـامانی زۆرتری نەداوەتە بەندەکانیتر. بەڵام لە سۆنگەی بەزەییەکەوە کە لەگەڵ تاقمێک بوویە، رەنج و ئـازارو کار و ئەرکی دونیای لە کۆڵ کردوونەتەوە و باری بەخێو کردن و رەنجـی ئـەمانی خـستۆتە ئەسـتۆی دارا و دەوڵەمەندانەوە و پێیانی فەرمووە تا بە قەدەر نیاز و ئاتاجی ئەو بەنـدە هێـژا و خۆشەویـستانەی

---

١- قورئان (٢٦٣/٢) ئەوەی ئاگایان لێنییە، وا دەزانن هیچ ئاتاج نین، چونکە حەیایان بەخۆیە.

٢. کریڤ: قەوم و خوێش.

خودا، پێیان بدەن، تا ئەم هێژایانە بیر و هۆش و هێـز و توانیـان لـەرێی بەنـدەگی و پەرسـتنی خـوادا بەخت کەن.

هەروەها چونکە ئاتاجی و نیاز دەبێتە هۆی شـڵەژانی بیریـان، نـانی ئـەمان لـە خـوانی سـامانداران دانراوە تا بەقەدەر نیازیان پێیان بدرێ و نزای خێریان، ساماندارانیش لە گوناح و تاوان پاکژ کاتەوە.

بۆیە هەژار و دەروێش ئەو شتەی وەریدەگرێ،دەبێ بە مەبەستی چارەسەرکردنی نیـازەکـانی بـێ و بپژێتە سـەر بەنـدەگی خـوا و بایـەخی ئـەم چاکـەی پـەروەردگارە بزانـێ کـە سـاماندارانی کردۆتـە خزمەتکاری وی، تا ئەم بە ئارخەیانی بپەرژێتە سەر پەرستنی خوا.

ئەمە وەکوو ئەوەیە کە پادشایان خزمەتکارانی تایبەتیان -کە پێیان خۆش نـەبێ لـە پـێش چاویـان بزربن- نەهێڵن بپەرژێنە سەر کاری دونیا، کەچی ئەو گوندی و مامەڵـەچییانە کـە پـەرای[1] تایبـەتیان لێ ناوەشێتەوە، هێناوەتەژێر رکێفی ئەمانە، تا بـاج و پیتاکیـان لـێ وەربگـرن و بـەرگی خزمـەتکارانی تایبەت لەبەرکەن.

هەر وەکوو چۆن مەبەستی خونکاران لەم هەموو دەست و پێوەندانە، خزمەتی ئەم تایبەتانەی دەربارە، مەبەستی پەروەردگاریش لەم هەموو ئافەریدەیە، پەرستینی پەروەردگاری هێژایە. بۆیە فەرمووی: وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ[2]؛ کەواتە هەژار ئەو شتەی وەریدەگرێ، دەبێ بەم مەبەستە بێ؛ بەم بۆنەوە پێغەمبەر فەرمووی: «پاداشی زەکاتدەر پتر لە زەکات وەرگر نییە، چونکە بە قەدەر نیازی وەردگرێ». مەبەست ئەو کەسەیە کە بە نیازی پەرژانە سەر کاری دین بێ.

**ئەرکی دووەم**- زەکات وەرگر دەبێ بزانێ ئەوەی پێی دراوە لەلایەن پەروەرێنەریەوە بووە کە زەکاتدەری هان داوە و کردوویەتە هۆکارێک بۆ ئەم مەبەستە. ئەو هاندەرەش بریتیە لەو بڕوایە کە خودا بە بەندەی خۆی داوە تا بزانێ رێی نەجات و رزگاربوونی لە سۆنگەی خێر و چاکەیە. بێ‌گومان گەر ئەم دنەدەرەی نەبوایە، تۆزکاڵێک لە ماڵ‌وسامانی خۆی بە کەس نەدەدا. کەواتە دەبێ بە منەتی ئەو کەسەی بزانین کە ئەو دنەدەریەی لە دڵ داناوە. کە زانی زەکاتدەر هۆکارێکی گەردن کەچی پەروەرگارە، دەبێ وەکوو ناونجییەک سەیری بکا و بە چاکەی بزانێ و سوپاسی کا: «فَإنَّ مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاس لَمْ يَشْكُرِ الله»[3]؛ چونکە پەروەردگار کە کردەوەی بەندەکانی خولقاند، پەسنیشیان دەکا. هەردەم

---

١- پەرا: خزمەت.

٢ - قورئان (٥٦/٥١) من هەر بۆیە جندۆکە و مرۆم دروس کردووە بمپەرستن. (هـ)

٣ - ئەوەی بە چاکەی خەڵکی نەزانێ، بە چاکەی خوداش نازانێ.

پێیان هەڵدەڵێ و وەکوو فەرمووی: نِعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ[1]؛ دیسان فەرمووی: إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا[2]؛ ئەو کەسەی کرایە هۆی خێر و چاکە، رێز و شان و شکوی پێ درا. هەروک فەرمووی: «طُوبی لِمَن خَلَقْتَهُ لِلْخَيْرِ وَ اَجرَيْتَ الْخَيْرَ عَلَی يَدَيْه[3]»؛ کە واتە پێویستە رێزی خۆشەویستەکانی بگیرێ و واتای سوپاس هەر ئەمەیە. هە روەها دەبێ نزای کەن و بڵێن: «طَهَّرَ اللهُ قَلْبَکَ فِی قُلُوبِ الأبرارِ وَ زَکّی عَمَلَکَ فِی عَمَلِ الأخيارِ وَ صَلّی عَلَی رُوحِکَ فِی اَرواحِ الشُّهَداء[4]».

لە خەبەردا وا هاتووە کە هەرکەس دەگەڵتان بە چاکە بزووتەوە، ئێوەش چاکەی دەگەڵ بکەن؛ ئەگەر پێتان نەکرا، ئەوەندە دوعای بەخێری کەن تا هەست بکەن پەرسڤی چاکەیتان داوەتەوە و سەرلەبەری سوپاس ئەوەیە کە نوقسانی سەدەقە بشارێتەوە و کەمبوونی بە کەم نەزانێ و بە سووکی سەیری نەکا. هەروەک مەرجی زەکاتدەر ئەوەیە، خێرەکەی، هەرچەن زۆر و زەوەندەش بێ، بە کەم و کورتی بزانێ.

**ئەرکی سێهەم**: بێجگە لە حەلاڵ چی دی وەرنەگرێ و توخنی ماڵی زۆروێژان نەکەوێ و سەیری ماڵی نزوول نەکا.

**ئەرکی چوارەم**- زۆرتر لە ئاتاجی وەرنەگرێ: گەر بۆ سەفەر وەریدەگرێ، پتر لە خەرجی رێی نەبێ؛ ئەگەر قەرزدارە، زۆرتر لە قەرزی نەسێنێ؛ گەر بۆ ماڵ و خێزانی دە درهەمی پێویستە، یازدە درهەم وەرنەگرێ؛ چونکە ئەم یەک درهەمە حەرامە. ئەگەر لە خانوویدا کۆتاڵ و بەرگ و جل و پارچەیەکی زێدەی هەیە، نابێ زەکات وەربگرێ.

**ئەرکی پێنجەم**- گەر زەکاتدەر شارەزا نەبێ کە لە کام پاژی دەداتێ، دەبێ بپرسێ کە: «ئەمە لە بەشی هەژارانە یا بەلەنگازان؟» ئەگەر نەیزانی و ویستی هەشت یەکانەی زەکاتی پێ بدات، لێی نەستێنێ، چونکە بەپێی بۆچوونی شافعی هەمووی نابێ بدرێتە یەک کەس.

## خێر و ودمی سەدەقە دان

پێغەمبەر فەرمووی: «سەدەقە بدەن، هەرچەن تەنیا خورمایەکیش بێ؛ چونکە هەژارێ دەبووژێنێتەوە و وەکوو ئاو بە ئاوردا بکەی گوناحێک دەکوژێنێتەوە». دیسان فەرمووی: «خۆتان لە

---

١ - قورئان؛ ٤٤/٣٨. عەبدی چاک بوو؛ بەراستی ئەو تۆبەکار بوو. (هـ)

٢ - قورئان؛ ٤١/١٩. هەر راست و پێغەمبەریش بوو. (هـ)

٣ - بەختەوەر ئەو کەسەی کە بۆ چاکەکاری خولقاندم و چاکەکاریم بە هۆی دەستەکانی ئەوەوە ئەنجام دا.

٤ - پەروەردگار دڵت لە نێو چاکان و کردەت لە کردەی مێرخاسان پاکژ کاتەوە و لە ریزی گیانی شەهیداندا سڵاو بنێرێتە سەر گیانت.

دۆزەخ دەرباز کەن، تەنانەت ئەگەر بە دەنکێک خورما بێ؛ ئەگەر نەبوو قسەیەکی خۆش». دیسان فەرمووی: «هیچ موسوڵمانێک لە ماڵی حەڵاڵ خێرێک ناکا مەگین ئەوەی پەروەردگار بە دەستی خۆی رایبێنێ و بە خێوی کا، وەکوو چۆن ئێوە وڵاخێکتان بەخێو دەکەن؛ تا ئەو خێرە وەکوو کێوی ئوحۆد گەورە و بەپێز بێ». هەروەها فەرمووی: «لە رۆژی پەسڵاندا هەرکس لە سای سەدەقەی خۆی دەحەسێتەوە تا کاتی دادوەری رادەگا». پرسیاریان کرد: «کام سەدەقە چاترە؟» فەرمووی: «ئەوەی کە لە کاتی لەش‌ساغی بیدەی و هەست‌کەی ژیانت زۆری لەبەر ماوە و لە هەژاری ترست نەبێ؛ نەک ئەوەی رامێنی تا ئەو دەمەی گیانت دەگاتە سەر لێوان و ئەوسا بڵێی: ئەمە بۆ فلان‌کەس و ئەوە بۆ فیسار کەس».

عیسا گوتی: «هەرکەس هەژارێک لە خێری خۆی نائومێد کا و بە دەستی بۆش بینێرێتەوە، تا حەوت رۆژان فریشتەکان سەربە خانوویدا ناکەن». پێغەمبەر دوو کاری قەد بە کەس نەدەسپارد: بە دەستی خۆی خێری دەدایە هەژاران، ئاوی تارەتی شەو دادەنا و سەری دادەدا. هەروەها فەرمووی: «هەرکەس جلکێک بکاتە بەر هەژارێ، تا ئەو دەمە هەودایەک لەو جلکە مابێ، خودا لە پەنای خۆیدا رایدەگرێ». عایشە، پەنجا هەزار درهەمی دایە خێرات و سەدەقە و هیچ جلکێکی بۆ خۆی نەکڕی، لە کاتێکدا کراسەکەی پینەکرا بوو. ئیبنی مەسعوود دەڵێ:«پیاوێک حەفتا ساڵ بەندەگی خودای کرد؛ گوناحێکی گەورەی تووش بوو، سەروجەمی عیبادەتی بەفێڕۆ چوو؛ رێی کەوتە لای هەژارێک، پارووە نانێکی پێدا: پەروەردگار گوناحەکەی سڕیەوە و خێری عیبادەتی حەفتا ساڵەی پێ دایەوە».

لوقمان گوتی بە کوڕەکەی: «هەرکات تووشی گوناحێ بووی، سەدەقەیەک بدە». عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، شەکری زۆری دەدایە سەدەقە و دەیگوت: «خوا فەرموویە: لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ[1] و منیش گەلێک حەزم لە شەکرە». سەفیانی سووریش دەڵێ: «هەرکەس خۆی بەخێری سەدەقە نیازمەندترو ئاتاجتر لەو هەژارەی نەزانێ کە سەدەقەی پێ‌دەدا، لێی قبووڵ ناکرێ». حەسەنی‌بەسری، کۆیلەفرۆشێکی بینی کەنووژەیەکی[2] جوانکیلە و شووشەیی لەگەڵە، گوتی: «بە دوو درهەم پێمی دەفرۆشی؟» گوتی: «نە». گوتی: «هەڕۆ! خودای مەزن حووریەک کە زۆر لە مەی تۆ بەدەوترە، بە دوو بۆڵە خورما دەفرۆشی»؛ واتە: سەدەقە.

---

١- قورئان (٩٢/٣) تا لەو شتەی ئێمە خۆشتان گەرەکە نەبخشن لەرێی خودادا، هەرگیز هیچ خێروو پێ ناگا. (هـ)

٢ - کەنووژە: کەنیز؛ کچی کۆیلە.

## بنەمای شەشەم- ڕۆژوو و مەرجەکانی

ڕۆژوو یەکێک لە هیمەکانی موسوڵمانییە. پێغەمبەر گوتی، خوا فەرموویە: هەرچاکەیەک دە تا حەوتسەد پاداشی پێ دەدەم، بێجگە لە ڕۆژوو کە بۆ خۆم پاداشی دەدەمێ[1]. خودای مەزن دەڵێ: إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ [2] حِسَابٍ»؛ پاداشی ئەوانەی لە هەمبەر شاوەتەکانەوە خۆڕاگرن، لە وتن نایە و لە ڕادە بە دەرە. پێغەمبەر فەرمووی: «پشوو درێژی نیوەی ئیمانە و ڕۆژوو نیوەی پشوو درێژییە». دیسان فەرمووی: «بۆنی زاری بە ڕۆژوو، لە کن پەروەردگار خۆشتر لە بەرامەی میسکە». خواش فەرموویە: «بەندەی من بۆ من چشی لە خواردن، خواردنەوە و شاوەت کردووە و هەر خۆم دەتوانم پاداش بدەمەوە». دیسان گوتی: «خەونی ڕۆژوودار عیبادەتە». هەروەها: «کاتێ مانگی ڕەمەزان گەیشت، دەرکەکانی دۆزەخ دادەخرێن و دەرکەکانی بەهەشت ئاوەڵا دەبن و شەیتانەکان دەکۆت و بەند دەکرێن و بانگ دەدرێ: "ئەی خێرخواز! وەرە کە کات کاتی تۆیە و ئەی شەڕخواز! ڕامێنە، کە جێی تۆ نییە"».

لە گەورەیی ڕۆژوو ئەوەیە کە پەروەردگار ئەم پەرستنەی خستۆتە سەر خۆی و دەڵێ: «الصَّوم لـی وَ أنا أُجْزی بَه[3]»؛ هەرچەند هەموو پەرستنەکان بـۆ وییـە، وەکـوو ئـەوەی گـوتی کەعبـە خـانووی منـە و کەچی هەموو دونیاش هی ئەوە. ئەم تایبەت بە خوا بوونەی ڕۆژوو لە سۆنگەی دوو دانستەوەیە:

**یەکەم**- ڕاستەقینەی ڕۆژوو نەکردن و وازهێنانە[4]. ئەمەش کاری دەروونە و لە بەرچاوان بـەرپیوارە و

---

١ - لە ئەحیادا هاتووە: هەرچاکەیەک دە تا حەوتسەد پاداشی هەیە، بەڵام ڕۆژوو تایبەت بە خۆمە و خۆم پاداشی دەدەمەوە (کتێبی ڕۆژوو، ل ٢٣٢).

٢ - (قورئان، ٣٩/١٠) بێگومانە ئەو کەسانەی خۆڕاگرن، بە تەواوی و بەبێ حیساب پاداشی خۆیان وەردەگرن. (هـ)

٣ - ڕۆژوو بۆ منە و خۆم پاداشی دەدەمەوە.

٤ - لە ئەحیادا: ان الصوم کف، و ترک.

چونکە نییەت هێنانی لە شەودایە، دوورووی ڕێ ناباتە سەری.

**دووهەم-** ئەوەیە کە جۆرێک گەمارۆدان و توندییە دەگەڵ دوژمنی خودا، واتە ئیبلیس؛ چونکە لەشکری وی شاوەتە و ڕۆژوو شاوەت دەبەزێنێ؛ لە ڕاستیدا ڕۆژوو دووری لە شاوەتەکانە. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «شەیتان وەکوو خوێن لە دەمارەکانی مرۆدا لە هات و چۆیە، بە برسێتی و تینوێتی ڕێی هاتوچووی پێ تەنگ کەن».

عایشە گوتی: «لە کوتانی دەرگای بەهەشت مەحەسێوە» گوتیان: چۆن؟ گوتی: بە ڕۆژوو»، واتە بە برسێتی ڕۆژوو. هەروەها گوتی: الصَّوم جُنَّة»؛ ڕۆژوو قەڵغانە. کۆسپ و چەڵەمەی هەموو عیبادەتەکان شاوەتەکانن؛ ئاریکار و پشتگری شاوەتەکان تێرییە و برسیەتیش لەشکری شاوەت تێک دەشکێنێ.

## فەرزەکانی ڕۆژوو

فەرزەکانی ڕۆژوو شەشن:

**فەرزی یەکەم-** بزانێ سەرەتای مانگی ڕەمەزان کەنگێیە، تا بزانێ مانگ بیست و نۆ ڕۆژە یا سی. لەسەر پەیڤی یەک موسوڵمان دەبێ دڵنیا بێ، بەڵام بۆ جێژن نابێ کەمتر لە دوو کەس بن. هەرکەس لە باوەڕپێکراوێکی بیست، ڕۆژوو لەسەری پێویستە، هەرچەند قازی لەسەر پەیڤی ئەو کەسە حوکمی نەدابێ. ئەگەر لە شارێکدا کە پتر لە شازدە فرسەنگ مەودایان بێ، ڕۆژووی ڕەمەزانیان گرت، لەسەر ئەم شارە پێویست نییە. بەڵام کە کەمتر بوو، پێویستە.

**فەرزی دووهەم-** نییەت هێنانە. دەبێ هەموو شەوێ نییەت بێنێ و بیر کاتەوە کە ئەمە ڕۆژووی ڕەمەزانە و لەسەری فەرز و پێویست کراوە. هەر موسوڵمانێ کە ئەمەی لەبیربێ، دڵی لە نییەت بۆش نابێ و مەرج نییە کە بەزار بیڵێ.

لە شەوی شکدا[1] ئەگەر بڵێ: «نییەتم هەیە سبەینێ بە ڕۆژوو بم ئەگەر ڕەمەزان بوو»، ڕەوا نییە تا ئەو کاتەی بە هۆی باوەڕپێکراوێکەوە شک و دڕدۆنگی نەمێنێ. بەڵام بۆی هەیە لە دوایین شەوی ڕەمەزاندا وا بڵێ، هەرچەند شک و گومانی لەسەر بێ؛ چونکە گریمانە لەسەر ئەوەیە کە ڕەمەزان هێشتا تێنەپەڕاوە. ئەگەر کەسێک لە شوێنێکی تاریکدا ڕاگیرابێ، بۆی هەیە بە بیر و بۆچوونی خۆی ڕۆژوو بگرێ و کاتی ڕەمەزان دیاری کا. ئەگەر شەو نییەت بێنێ بە بێ ئەوەی هیچی خواردبێ، نییەتی بەتاڵە و نابێ؛ ئەگەر پێی وا بوو مەهکی دوایی دێ و هەرواش بوو، ڕۆژووەکەی دروست و ڕەوایە.

---

١- شەوی شک: شەوی سییەمی مانگی شەعبان.

**فەرزی سێهەم**- نابێ بە قەستی و بە هیچ جۆرێک هیچ شتەک بگەیێنێتە نێو ورگ و دەماری. حەجامەت کردن، چاوڕەشتن، گوێ سڕین و شەرمگا خاوێن کردنەوە، هیچ یەکیان ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە. هەروەها شتی گەر ئاو لە کاتی دەمشۆردنی دەسنوێژ لە گەروو بڕواتە خوارەوە، هیچ زیانی نییە؛ مەگین ئەوەی لە کاتی دەمشۆردندا زێدەڕۆیی بکرێ و ئاو بڕواتە خوارەوە. ئەگەر لە سۆنگەی لەبیرچوونەوە شتێکی خوارد و پاش ئەوە زانی بانگی بەیانیان گوتووە یاخۆ هێشتا بانگی شێوان نەبێژراوە، ئەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵە و دەبێ بەقەزا بیگێڕێتەوە.

**فەرزی چوارەم**- نابێ دەگەڵ هاوسەری خۆی تێکەڵ بێ. ئەگەر ئەوەندەی توخن کەوێ کە پێویستی بە خۆشۆردن بێ، ڕۆژووی بەتاڵ دەبێتەوە؛ بەڵام ئەگەر لەبیری چووبێ کە بەڕۆژوو بووە، بەتاڵ نابێتەوە. ئەگەر شەو، کاتی نووستن توخنی یەک کەوتبێتن و بەیانی خۆی شۆردبێ، ڕۆژووەکەی ڕەوایە.

**فەرزی پێنجەم**- نابێ بە هیچ چەشنێک هان بدا شاوەتی بێتەوە: ئەگەر توخنی خێزانی کەوێ- هەرچەن دەگەڵی تێکەڵی نەکردبێ- و بەهۆی لاوێتیوە مەترسی ئاوهاتنەوەی بێ و ئاوی بێتەوە، ڕۆژووی بەتاڵە.

**فەرزی شەشەم**- نابێ بە قەستی بڕشێتەوە: ئەگەر بەبێ ویستی خۆی ڕشایەوە، ڕۆژووی بەتاڵ نابێتەوە. ئەگەر لە سۆنگەی پەتا، یان هەر نەخۆشییەکی‌ترەوە بەڵغەم لە گەرووی هاتەدەر، هیچ زیانی بۆ ڕۆژووی نییە؛ چونکە خۆپاراستن لەم کارە دژوارە. بەڵام ئەگەر گەیشتە نێو زار و پاشان قووتی دا، ڕۆژووی بەتاڵە.

## سوننەتەکانی ڕۆژوو شەشن

درەنگ کردن لە پارشێو و پەلە کردن لە بەربانگ‌کردنەوە بە ئاو یا خورما بەرلەنوێژ، مسواک نەکردن دوای بانگی بەیانی، دلاوایی لە خێر و چاکە و نان بە هەژاردان و قورئان خوێندن و لە مزگەفت ڕۆنیشتن، بەتایبەت دە ڕۆژووی سێهەمی ڕەمەزان، چونکە لەیلەتولقەدری تێدایە؛ پێغەمبەر لەم دە ڕۆژەدا نوێنی ڕانەدەخست و سەروێنی لەسەر لانەدەبرد و خۆی و بنماڵەی بەردەوام خەریکی عیبادەت دەبوون.

لەیلەتولقەدر یا شەوی بیست و یەک، یان بیست و سێ، یان بیست و پێنج یاخۆ بیست و حەوت یان بیست و نۆ. ڕای زۆرتر لەسەر بیست و حەوتە؛ بەڵام باشتر ئەوەیە ئەم دەڕۆژە بەردەوام لە عیبادەت و بیرکردنەوەدا بێ. ئەگەر نەزری کردبێ کە ئەو دە ڕۆژەی گۆشەنشین بێ، نابێ بێجگە بۆ ئاودەست بێتە دەر و بێجگە بە قەدەر دەسنوێژ شۆردنێک لە ماڵدا بمێنێتەوە. ئەگەر بۆ نوێژی مردوو

یاخۆ سەردانی نەخۆش یان شایەتی یا خۆشۆردن بێتە دەر، زاویەنشینەکەی دەپچڕێ. دەست و روو شۆردن و نان خواردن لە مزگەفت، گرفتێ نییە. هەروەها هەرکات کە لە ئاودەست هاتەوە، دەبێ نییەتی تازە بێنێ.

## نهێنی و راستەقینەی ڕۆژوو

بزانە کە ڕۆژوو سێ ئاستی هەیە: ئاستی خەڵکی رەمەکی، دووەم ئاستی خەڵکی هەڵکەوتە و سێهەم ئاستی هەڵکەوتەی هەڵکەوتووان. ڕۆژووی خەڵکی رەمەکی هەر ئەوەیە کە هاتە گوتن. ئەو پەڕی ئەو ڕۆژووە راگرتنی دەروون و شەرمگایە و ئەمەش کەمترین ئاستی ڕۆژووە.

ڕۆژووی هەڵکەوتەی هەڵکەوتووان بەرزترین ئاستی ڕۆژووە. ئەمەش بریتیە لەوەی کە دڵی خۆی لەبیری هەرچی بێجگە خوایە بپارێزێ و نووکوبەدی خۆی بداتە خودای و لە هەرچی بێجگە ئەوە- بە دڵ و بە لەش- بە ڕۆژوو بێ. لەم ئاستەدا بیرکردنەوە لە هەرچی بێجگە خوا بێ یاخۆ بەندیواری پێوەبێ، ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە. ئەگەر بیر لە چەمکێکی دونیایی بکاتەوە -هەرچەند حەلال بێ- ڕۆژووی بەتاڵ دەبێتەوە؛ مەگین بابەتێکی دونیایی کە لە دیندا ببێتە هاریکاری، ئاوەها بابەتێک لە راستیدا، دونیایی نییە. تەنانەت دەڵێن ئەگەر لە کاتێکدا کە ڕۆژووە، بیر لەوەی کاتەوە بە چی ڕۆژووەکەی کاتەوە، گوناحی بۆ دەنووسرێ؛ چونکە هۆی ئاوەها بیرکردنەوەیەک ئەوەیە کە لەو شتەی خوا دەیکاتە بەشی، ئارخەیان نییە. ئەمەی بێژرا ئاست و رادەی پێغەمبەران و چاکانە و هەرکەس پێی ناگا.

بەلام ڕۆژووی هەڵکەوتووان ئەوەیە کە هەموو ئەندامانی لە کاری نابەجێ بپارێزێ و تەنیا بە دەروون و شەرمگا قەناعەت نەکا. بە شەش شت ئەم ڕۆژووە دەگاتەئەنجام:

**یەکەم** ئەوەیە چاوی لە هەرچی بێپەرژێنێتە سەر بێجگە لە خوا، بنووقێنێ، بەتایبەت لەو شتە دەبنە هۆی هەڵخڕاندنی شاوەت. پێغەمبەر فەرمووی: «روانین، تیرێکی ژاراوییە لە تیرەکانی شەیتان. ئەوەی لەبەر پەروەردگار، خۆی لێ بپارێزێ، پەروەردگار دیاریەکی ئیمانی دەداتێ کە تام و چێژی لە دڵ دەمێنێ و چێژی لێ دەبا».

ئەنەس دەڵێ پێغەمبەر فەرمووی: «پێنج شت ڕۆژوو پووچەڵ دەکاتەوە: درۆ، خۆسپە و غەیبەت، شۆفاری و دووزمانی، سوێندی درۆ و روانینی شاوەتی».

**دووەم** ئەوەی کە بێدەنگ بێ و لەهەرچی قسەی بێبایەخە خۆی لابدا؛ جا یاخۆ خەریکی یادی خودا بێ یاخۆ قورئان خوێندن. شەڕەقسە و ململانێ کردن، لە ڕیزی قسەی پڕوپووچی زیانبارن. بەلام درۆ و خۆسپە بە بۆچوونی زۆربەی زانایان، ڕۆژووی خەڵکی رەمەکیش پووچەڵ دەکەنەوە.

لە خەبەردا هاتووە کە: «دوو ژن بە ڕۆژوو بوون و لەبرسان وەختەبوو بمرن. ئیزنیان لە پێغەمبەر خواست ڕۆژوو کەنەوە. دەفرێکی بۆ ناردن تا تێیدا بڕشنەوە. لە ناخی هەریەکەیان پاروویەک خڵتە خوێن هاتە دەر و خەڵکی گەلێک ڕامان. پێغەمبەر فەرمووی ئەم دوو ژنە لەو شتەی خوا بۆیانی حەڵاڵ کردبوو ڕۆژوویان کرد و بەو شتەی لێیانی حەرام کردبوو، ڕۆژوویانی کردەوە و خەریکی خوسپە و پاشملەگوتن بوون؛ ئەوەش لە گەروویان هاتەدەر، گۆشت ئەو کەسانە بوو کە خواردبوویان[1]».

**سێهەم** دەبێ گوێ لە بیستنی ئەو شتانەی کە ناڕەوان، بپارێزێ؛ چونکە بیسەر شەریکی بێژەرە لە گوناحی درۆ و خوسپەدا.

**چوارەم** ئەوەیە کە دەست و پێ و ئەندامانی لە کاری نەگونجاو و نابەجێ بپارێزێ. ئەوەی بە ڕۆژوو بێ و خۆی لە کاری ناحەز نەبوێرێ، وەک نەخۆشێکە کە لە بەر نەخۆشییەکەی میوە نەخوا، کەچی لەو لاوە خۆی لە هیچ ژارێک نەبوێرێ. گوناح وەکوو ژارە؛ کەچی خۆراک زۆر خواردنی زیانی هەیە، نەک خودی خۆراک. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «زۆرن ئەو ڕۆژوودارانەی کە بەشیان لە ڕۆژوو تەنیا برسێتی و تینوێتییە».

**پێنجەم** لە بەربانگ کردنەوەدا وردبێتەوە و ئاگادار بێ لە مالی حەرام نەخوا و لە حەڵاڵیش زۆرتر لە نیازی نەخوا. چونکە، گەر ئەوەی بە ڕۆژ خۆی لێی دوورکردۆتەوە، بە شەو توخنی کەوێ و کۆی کاتەوە، چ خێرێکی بەنسیب بووە؟ مەبەست لە ڕۆژوو، لاواز کردنەوەی شاوەتەکانە و کەچی خۆراکی دوو ژەم لە ژەمێکدا خواردن، شاوەتەکان دەبووژێنێتەوە و ورەی زۆرتر دەکا؛ بەتایبەت کە هەموو جۆرە خۆراکێکی کۆوە کردبێ. تا ورگ خالی نەبێ، دڵ پاکژ نابێ؛ هەروەها سوننەت ئەوەیە بە ڕۆژ زۆر نەنوێ تا ئاسەواری برسێتی و کەم هێزی لە خودا ببینێ. شەوانیش کە زۆری خوارد زوو دەخەوێ و نوێژی شەوی پێ ناخوێنرێ. بۆیە پێغەمبەری فەرمووی: «لە لای پەروەردگار هیچ دەفرێکی پڕ کراو، دزێوتر لە گەدە نییە».

**شەشەم**- ئەوەیە کە پاش بەربانگ کردنەوە، دڵی لە نێوان ترس و هیوادا هەڵوەدا بێ و نەزانێ کە عیبادەتی ئەو ڕۆژەی لێ وەردەگیرێ یان نە. حەسەنی بەسری ڕۆژی جێژنی ڕەمەزان لای تاقمێکەوە ڕادەبورد، بینی خەریکی یاری و پێکەنینن. گوتی: «پەروەردگار مانگی ڕەمەزانی وەکوو گۆڕەپانێک ڕانا تا هەرکەس بۆ بە جێ هێنانی بەندگی زۆرتر بکۆشێ و پێشتر کەوێ. تاقمێ پێش کەوتن و تاقمێ پاش. سەیرن ئەو کەسانەی پێدەکەنن وا ڕاستەقینەی حالی خۆیان نەناسیوە. سوێند بە

---

[1] - مەبەست ئەوەیە کە دەڵێن: «هەرکەس خوسپەی برا و خوشکی موسولمانی کا، وەکوو ئەوەیە کە گۆشتی برای مردووی خۆی بخوا».

پەروەردگار گەر لەم نهێنییە پەردە لادەن، وەرگێراوان شاد و شوکورن و وەرنەگیراوان مەلوول و ڕەنگ‌زەرد و کەس پێناکەنێ و یاری ناکا».

بەمەی بێژرا تێگەیشتی ئەوەی لە ڕۆژوو، تەنیا نەخواردن و نەخواردنەوەی وەرگرتبێ، ڕۆژووەکەی وەکوو جەستەیەکی بێ‌گیانە؛ چونکە لەڕاستیدا رووح و گیان و ڕاستەقینەی ڕۆژوو، ئەوەیە کە خۆ بکاتە وەکوو فریشتەکان؛ چونکە ئەمانە لە هەرچی شاوەت بێ پاک و پاکژن و شاوەت بەسەر چوار پێ و ولاخدا زاڵ و سوارە و لەمان بە دوورە. هەر مرۆڤێک کە شاوەتی بەسەردا زاڵ بێ، لە ڕادەی چوار پێیانە، کە شاوەتی لاواز بووەوە، وەکی مەلائیکەی لێ دێ و لەم سۆنگەوە لێیان نزیک دەکەوێتەوە (نزیکی بە تایبەتمەندی، نەک بە شوێن). فریشتەکان نزیکن لە پەروەردگار؛ کەواتە ئەمیش نزیک بۆتەوە. بەڵام کە کەوتە خۆ بۆ دابین‌کردنی شیو، یارمەتی شاوەت دەدات بۆ گەیشتن بە مەبەستی. شاوەت هێزی بە پێز دەبێ، نەک لاواز، لەم سۆنگەوە ڕێ ناباتە سەر ڕاستەقینەی ڕۆژوو.[1]

## حوکمەکانی ڕۆژووشکاندن

حوکمەکانی ڕۆژوو بریتین لە قەزا و کەفارە و فدیە و دووری لە خواردن لە ڕەمەزاندا و هەریەکە لە جێی خۆی پێویستە جێبەجێ بکرێ:

قەزا لەسەر هەموو موسوڵمانێ کە بەبێ بیانوو یان بە عوزر و بیانووەوە ڕۆژوو بشکێنێ پێویستە؛ ژنی مەهک و مسافیر و ژنی دووگیان و لە دین دەرچووگ، لەسەریانە ڕۆژووی فەوتاویان بگرنەوە. بەڵام منداڵ و شێت لەسەریان فەرز نییە.

کەفارە تەنیا بۆ بەقەستی تێکەڵی کردن یاخۆ شاوەت هێنانەوە فەرز کراوە؛ ئەوەش بریتییە لەوەی کە کوێلەیەک ڕزگا کا، ئەگەر نەبوو دەبێ بە بەردەوامی دوو مانگ ڕۆژوو بێ، ئەگەر پێی نەکرا- بەهۆی نەخۆشییەوە- دەبێ شەست «مودد» خواردن بداتە نەداران، هەر هەژارێ یەک مودد. هەر مووددیش بریتیە لە مەنێ سێیەکێ کەم (دوو بەش لە سێ بەشی مەنێک).

دووری لە خواردن لەسەر کەسێک پێویستە بەبێ عوزر و بیانوویک ڕۆژووی شکاندبێ. بەڵام لەسەر ئافرەتی مەهک پێویست نییە، هەرچەن لە نیوەڕۆژدا پاکژ بێتەوە. هەوەرها لەسەر مسافیر و نەخۆش (هەرچەن موسافر گەیشتبێتە مەنزڵ و نەخۆش چاک بووبێتەوە) پێویست نییە.

---

١- لە «احیاء»دا وا هاتووە: «کە نهێنیی ڕۆژوو لەلای خاوەن دڵ و خاوەن هزران ئاوەهایە، چ کەڵکێک لەمەدایە کە نانی نیوەڕۆ نەخوا و دەگەڵ شیو کۆیان کاتەوە و پێکەوە هەردوویان بخوا و هەوساری شاوەتانی‌تر بە درێژایی ڕۆژ بەرەهەڵدایێ و هیچ ئاوڕیان لێ نەداتەوە. (کتێبی ڕۆژوو.ل ٥١٨)

کە لە ڕۆژی شکدا کەسێک شایەتی بدا مـانگی دیـوە، پێویـستە کـە هەرچـەن نانیـشی خواردبـێ، هیچی دی نـەخوا و وەک ڕۆژووداران ببزوێتـەوە. ئـەوەش لـە نێـوانی ڕۆژدا سـەفەر کـا، نابـێ ڕۆژوو بشکێنێ؛ هەروەها ئەگەر ڕۆژووی نەشکاندبێ و لە نیوەڕۆدا بگەنـە شـارێک، نابێ ڕۆژوو بـشکێنێ. بـۆ موسافیر ڕۆژوو چاتر لە شکاندنیە، مەگین توان و ورەی نەمێنێ.

«فدیە»ش بریتییە لە دووپاژ لە سێ پاژی مەنێک خـۆراک کـە بدرێتـە نـەدارێ. ژنـانی شـیردەر و حامیلە دەبێ هەم قەزای ڕۆژوو بەجێ بێنن، هەمیش فدیە بدەن؛ چونکـە بەبۆنـەی سـاواکەیەوە -کـە نەکوا برسی بێ- ڕۆژووی نەگرتووە، نەک لە ترسی نەخۆشی خۆی. پیرێکـی پەککەوتـە و بەسـالاچوو -کە زۆر کز و لاواز کەوتبێ- تەنیا فیدیەی لەسـەرە بـەجێی قـەزا. ئـەوەی قـەزای مـانگی ڕەمـەزان وەدرەنگ خا تا ئەوەی کە مانگی ڕەمەزانی سالی دوایی بگات، بـۆ هـەر ڕۆژێـک وەدرەنـگ کـەوتنی «مووددێک» خۆراک دەبێ بداتە هەژاران.

**سەرنج**

ڕۆژووگرتن لە ڕۆژانی هێژا و بەڕێزدا سوننەتە.

ئەوەی لە سالدا بێ: ڕۆژانی عەرەفە و عاشوورا و نۆ ڕۆژی سەرەتای زولحەجە و دە ڕۆژی سـەرەتای مانگی موحەڕڕەم و ڕەجەب و شەعبان. لە خەبەردا وا هاتووە کە پـاش مـانگی ڕەمـەزان، بـەرزترین و سەرترین ڕۆژوو، ڕۆژووی مانگی موحەڕڕەمە. هەموو مانگی موحـەڕڕەم سـوننەتە و دەڕۆژی سـەرەتای هێژاترە. لە خەبەرەکاندا وا هاتووە کە: «یەک ڕۆژ ڕۆژوو لە مانگە حەرامەکان، هێژاتـرە لـە سـێ ڕۆژی مانگەکانی‌تر» پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی پێنج شـەمۆ و هـەینی و شـەمۆی مانگـەکانی حـەرام بـە ڕۆژوو بێ، حەوتسەد سال عیبادەتی بۆ دەنووسرێ». مانگەکانی حەرام چوارن: زولقەعـدە و زولحەجـە و موحەڕڕەم و ڕەجەب. هێژاترینی ئەمانە زولحەجەیە، کە کاتی حەججە. لە خـەبـەردا وا هـاتووە کـە «پەرستن و عیبادەتی پەروەردگار لە هـیچ کاتـدا وەکـوو دە ڕۆژی سـەرەتای زولحەجـە هێـژا نییـە. ڕۆژووی تاقە ڕۆژێکـی ئـەم مانگـە بەرانبـەرە لەگـەڵ ڕۆژووی یـەک سالـی تـەواو. شـەونخوونییەکی بەرانبەرە دەگەڵ لەیلەتولقەدر». پرسـیاریان کـرد: «یـا ڕەسوولەڵـلا! خـەزاش وا نییـە؟» فـەرمووی: «خەزاش وا نییە؛ مەگین ئەوەی کەسێک هەم ئەسپەکەی بکوژرێ و هەم خوێنی خۆی برێژێ».

تاقمێ لە یارانی پێغەمبەر، خۆیان لەوەی کە سەرلەبەری ڕەجەب بە ڕۆژوو بن، بواردووە، تـا دەگـەڵ ڕەمەزان بەرانبەر نەبێ؛ بۆیە یەک یان دوو ڕۆژیان لێ خواردوو. بە گشتی باشتر ئەوەیـە ڕۆژانی دوایـی شەعبان ڕۆژوو نەگیرێ تا دەگەڵ ڕەمەزان تێکەڵ نەبێ. بەلام بۆ پێـشوازی لـە ڕەمـەزان، زۆر ناحـەزە ڕۆژانی شەعبان ڕۆژوو بگیرێ؛ مەگین بە مەبەستێک بێجگە لە پێشوازی ڕەمەزان بێ.

ڕۆژە هێژاکانی مانگ: ڕۆژە سپییەکانە؛ واتە سـێزدە، چـوارده و پـانزدەی مانـگ و لـە حەوتـەش دا

ڕۆژانی دووشەمۆ، پێنجشەمۆ و هەینی. بەڵام ڕۆژووی بـەردەوام لـە هـەموو ڕۆژەکـانی ساڵـدا، هـەموو ئەمانە دەگرێتە بەر؛ لە ساڵـدا پێـنج ڕۆژ نابـێ ڕۆژوو بگیـرێ: دوو ڕۆژی جێژنـان و سـێ ڕۆژی پـاش جێژنی قوربان. نابێ خۆ لەبەربانگ کردنەوە ببوێرێ، چونکە مەکرووهە. ئەگەر کەسـێک بـۆی نـەکرێ تەواوی ساڵ ڕۆژوو بگرێ، باشـتر وایـە ڕۆژێـک بـەڕۆژوو بـێ و ڕۆژێـک نـەبێ، ئەمـە ڕۆژووی داوودە و گەلێک هێژایە.

دەڵێن عەبدوڵلا کوڕی عەمروعاس لە پێغەمبەری پرسیار کرد کە هێژاترین ڕۆژ بۆ ڕۆژوو و شـێوازی ڕۆژوو گرتن چۆنە؟ لە وەرامدا فەرمووی: ڕۆژووی حەزرەتی داوود هێژاتـرین ڕۆژووە. گـوتی: «هێژاتـر لەمەم دەوێ». فەرمووی «لەمە هێژاتر نییە». خوارتر لەمە ئەوەیە دووشەمۆ و پێنجشەمۆ بـەڕۆژوو بـێ، دەگەڵ مانگی ڕەمەزان پێکەوە پتر لە سێیەکی ساڵێ دەگرنەوە.

ئەوەی لە ڕاستەقینەی ڕۆژوو گەیشت و زانی کە مەبەسـت لـە ڕۆژوو، شـکاندنی شـاوەت و خـاوێن کردنەوەی دڵە، دەبێ چاودێری دڵی خۆی بکا. کە وای کرد، هەندێ جار ڕۆژوو هێژاتـرە و بـڕێ جـار خواردن. بەم بۆنەوە بوو کە پێغەمبەر هەندێ جار بەردەوام ڕۆژووی دەگرت، بە چەشـنێ کـە هەنـدێ پێیان وابوو قەد ڕۆژوو ناکاتـەوە و هەنـدێ جـار ئەوەنـدە ڕۆژووی نـەدەگرت پێیـان وابـوو قـەد ڕۆژوو ناگرێ.

زانایان گوتوویانە گەلێک دزێو و ناحەزە کەسێک چوار ڕۆژ تێپەڕێ و هیچ ڕۆژێک لەو چـوار ڕۆژە بـە ڕۆژوو نەبێ -ئەمەیان لە جێژنی قوربان و سێ ڕۆژی پاش جێژن وەرگرتـووە[1]- هۆکەشـی ئەوەیـە کـە بەردەوام ڕۆژوو نەگرتن، دڵ ڕەش و تاریک دەکا و مرۆڤ تووشی بێئاگایی و دڵنووستوویی دێ.

---

١ - هەروەک ئاماژەی پێکرا، ڕۆژی جێژنی قوربان و سێ ڕۆژ پاش جێژن، ڕۆژوو گرتن شیاو نییە. بەڵام پتر لەوە کە دەکاتە چوار ڕۆژ، ڕۆژوو نەگرتن دزێوە.

## بنەمای حەوتەم- حەج

باش بزانەکەحەج لەبنەماکانی ئیسلامەو عیبادەتی تەمەنە. پێغـەمبـەر فـەرمـووی: «ئـەوەی مـرد و حەجی بەجێ نەهێنا، چ جوو بمرێ و چ مەسیحی، هیچ تەوفیر نەکا». دیـسان فـەرمـووی: «ئـەوەی لەشی بەفیسق و گوناح پیس نەکردبێ و زمانی بەقسەی پڕ و پووچ خەریک نەکردبێ و حـەج بـەجـێ بێنێ، لەهەمـوو گوناحـانی پـاک و خـاوێن دەبێتـەوە، وەکـوو ئـەو ڕۆژەی لـەدایک بووبـێ». دیـسان فەرمووی: «گوناحی زۆر هەن کە هیچ شت پاکانەیان بۆ ناگا، بێجگە ڕاوەستان لە عـەرەفات». دیـسان فەرمووی: «هیچ ڕۆژێـک وەکـوو ڕۆژی عەرەفـە، شـەیتان پەسـت و بچـووک و ڕووزەرد نییـە، کاتـێ دەنواڕێ بەزەیی پـەروەردگار بەسـەر خەڵـکیدا وا دەبـارێ و سـووچ و گونـاحی گـەورە و بچووکیـان دەشواتەوە». هەروەها فەرمووی: «هەرکەس بە مەبەستی ڕۆیـشتن بـۆ حـەج لـە مـاڵ بێتـەدەر و لـە ڕێگادا تووشی مەرگ بێ، پەروەردگار، تا ڕۆژی پەسلان هەموو ساڵ پاداشـی حـەج و عەمرەیـەکی بـۆ دەنووسێ. هەروەها ئەوەی لە مەکە یاخۆ مەدینە بمرێ، خێر و پاداشی هێندە زۆروزەوەندەیە لە وتـن نایە ». هەروەها گوتی: «حەجێک کە پەروەردگار قبوولی کردبێ، چاترە لە دونیـا و ئـەوەی تێدایـە و هیچ پاداشێک هاوسەنگی ناکا، مەگین بەهەشـت». هـەروەها: «هـیچ گوناحـێ پتـر لـەوە نییـە کـە کەسێک لە عەرەفەدا ڕاوەستێ و پێی وابێ تاوانەکانی نەبەخشراون».

عەلی کوڕی مووەفەق، کە یەکێک لە گەورەکانی دین بـوو، گـوتی: «ساڵـێکیان لـە حەجـدا بـووم، شەوی عەرەفە دوو فریشتەم بینی لە ئاسمان هاتنە خوارێ، بەرگی کەسـکیان دەبـەردا بـوو. یـەکیان گوتی بەویتر: "دەزانی ئەمساڵ چەن کەس هاتوونە حەج؟" گوتی: "نـە". ئـەویتر گـوتی: "شەشـسەد هەزار". گوتی: "دەزانی حەجی چەن کەس وەرگیراوە؟" گـوتی: "نـە". گـوتی: " شـەش کـەس"، لـە خەو ڕابووم، خەم و کەسەر دایگرتم و گوتم قەد ناشێ من لـەو شـەش کـەسـە بم، بـە دۆش دامـاوی کەوتمە ڕێ، تا گەیشتمە "شعر الحرام" ونەوزم دا. دیسان ئەو دوو فریـشتەم بـینی کـە هـەمان بـاس دەگێڕنەوە، یـەکیان گـوتی: "دەزانی پەروەرێنـەرمان ئەمـشەو چ حـوکمێکی لەسـەر خەڵـک داوە؟" گوتی: "نە"، گوتی: "بە هۆی هەریەک لەو شەش کەسـەوە سـەدهەزار کەسـی بەخـشراوە و هـەمووی

لەسای ئەو شەش کەسە وەرگرتووە". لە خەو هەستام بە شادییەوە و سوپاسی خودام بەجێ هێنا».

پێغەمبەر فەرمووی: «خوای دلۆڤان وای بڕیار داوە هەموو ساڵێ شەشسەد هەزار کەس زیارەتی ماڵی خوداکەن لە حەجدا، ئەگەر کەمتر لەمە بێ، ئەوەندەی مەلائیکە دەنێرێ تا تەواو بێ، وا کەعبە دەڕازێننەوە وەکوو جوان بنوێنێ و هەرکەس حەجی بەجێهێنابێ و دەستی لە پەردەی کەعبە وەردابێ، دەڕواتە نێو بەهەشت و ئەم فریشتانەش هاوڕێی دەبن لە بەهەشتدا».

## مەرجەکانی حەج کردن

هەر موسوڵمانێ کە بە تەمای حەج بێ، دەبێ لە کات و ساتی خۆیدا بێ، کاتی حەجیش شەوواڵ و زولقەعدە و نۆ رۆژ لە زولحەجەیە تا ئەوەی بەیانی رۆژی دەهەم بیێتە جێژن. لەم ماوەیەدا ئیحرام بەستن بۆ حەج دروستە و پێش ئەم ماوەیە گەر کەسێک ئیحرام ببەستێ و زیارەتی کەعبە کا، عومرەی بەجێ هێناوە. حەجی منداڵی باڵغ دروستە؛ بۆ کۆرپەی بەرمەمکان ئەگەر سەرپەرشتی لەلایەن ئەوەوە تەمای حەج کا و بیباتە عەرەفات و سەعی و تەواف بەجێ بێنێ، دروستە، کەواتە مەرجی راست و دروست بوونی حەج تەنیا موسوڵمانی و لەکاتی خۆی بەجێهێنانیە.

بەڵام مەرجی ئەوەی حەجەکەی ئیسلام بێ[1] و فەرزی بەجێهێنابێ، پێنجین: موسوڵمانی و سەربەستی و باڵغی و ژیری، پاشان لە کاتی خۆی حەجکردن. ئەگەر منداڵێک پێش حەج کردن و راوەستان لە عەرەفەدا باڵغ بێ، یاخۆ کۆیلەیەک پێش حەجکردن رزگار و سەربەست بێ، حەجی ئیسلامی لەسەر کەوتووە. بۆ حەجی عەمرەش هەر ئەم مەرجەی پێویستە، بێجگە لەکات؛ چونکە هەموو کات و ساتی ساڵ، کاتی حەجی عەمرەیە.

ئەو کەسەی کە بیەوێ بەجێی کەسیتر حەج بکا، دەبێ سەرەتا حەجی ئیسلام بەجێ بێنێ. ئەگەر پێش ئەوە نییەتی حەج بۆ کەسیتر بێنێ، حەج لەسەر خۆی دەکەوێ، نەک کەسیتر؛ سەرەتا حەجی ئیسلامە و دواتر قەزا و پاشان نەزر و ئینجا جێگری؛ بەم چەشنە و بەم ریزە دەبێ حەج بکا، هەرچەند نییەتی بە ئاوەژووی ئەمە بێ.

بەڵام مەرجی حەج لەسەر پێویست بوون ئەمانەن: ئیسلام، پێگەیشتوویی، ژیری، سەربەستی و توان و هێز.

---

[1] - واتە: مەبەستی ئەوە بێ کە یەکێک لە بنەماکانی ئیسلام بەجێ بێنێ.

**هێز دوو جۆرە:**

**یەکەم** ئەوەیە کە بتوانێ بە لەش و ئەندامی خۆی حەج بەجێ بێنێ؛ ئەمەش سێ شتە: **یەکەم** لەش ساغ بێ، **دووەم** ڕێگا هێمن و بێترس بێ و لەسەر زەریایەکی پڕ مەترسی یاخۆ ڕێگایەکی پڕ لە جەردە و ڕێگر نەبێ. **سێهەم**، دەبێ ئەوەندەی ماڵوسامان هەبێ کە پێی بکرێ خەرجی ماڵ و خێزانی و خەرجی ڕێگا و سەفەری و قەرز و قۆڵەی لێ دابنێ و پاشان بڕوا. هەروەها ئەگەر چوار پێ و ولاخێکی هەبێ، پێویست نییە بە پیاسە بڕوا.

جۆری **دووەم** ئەو کەسەیە کە نەتوانێ بۆ خۆی بڕوا، چونکە کەوتۆتە جێگا و وورەی ڕێگابڕینی لێبڕابێ و مەگین بەدەگمەن بتوانێ هەستێتە سەرپێ. کەچی ئەوەندەی ماڵوسامان هەیە کە پێی دەکرێ لەلایەن خۆیەوە و لەسەر خەرجی خۆی کەسێک بنێرێ و حەجی بۆ بکا و کرێشی پێبدات. ئەگەر کوڕەکەی پێی بکرێ بەخۆڕایی حەج بۆ بابی کا، لەسەریە پێی بسپێرێ کە بۆی بەجێبێنێ و پەرای باب کردن زۆر هێژایە. بەلام ئەگەر گوتی: «پارەت دەدەمێ تا کەسێک بەکرێ بگری» پێویست بە منەتی کوڕ ناکا.

کە هێز و توانی سەفەری دەست کەوێ، دەبێ بلەز بەجێی بێنێ. بەلام کە وەدرەنگ کەوت، ئەگەر بۆی بلوێ دەبێ سالیتر بڕوا. ئەگەر ئەوەندەی درەنگی کرد تاکوو مرد، گوناحبارە و دەبێ بە میراتەکەی حەجی بۆ بکرن؛ هەرچەند بە کەسی رانەسپاردبێ؛ چونکە ئەمە قەرزێکە لەسەریەو دەبێ بدرێتەوە.

عومەر گوتی: «بە تەمام لە شاراندا بلاو کەمەوە کە ئەوەی حەجی پێ دەکرێ و خۆی لێ دەبوێرێ، جەزیەی لێ بستێنن».

## هیم و پێویستی و شێوازەکانی حەج بەجێهێنان و ئەو کارانەی کە نابێ لە حەجدا بکرێن

ئەم هیمانە کە حەجیان پێ ڕەوا دەبێ، پێنجن:

ئیحرام دەبەر کردن و سووڕان بە دەوری کەعبە، کۆشەوە، ڕاوەستان لە عەرەفە و تاشینی موو بە پێی پەیڤێک.

پێویستەکانی حەج شەشن. هەرچەند ئەگەر ئەمانە بەجێنەهێنێ، حەجەکەی بەتال نابێتەوە، بەلام قوربانیکردنی مەڕێکی لەسەر پێویستە.

ئیحرام دەبەر کردن لە میقات: ئەگەر لەوێ بەبێ ئیحرام ببوێرێ، قوربانیکردنی مەڕێک و بەردهاویشتن و وەستان تا ئاوا بوونی خۆر و ڕۆیشتن بۆ «مزدلفە» لە شەودا هەروەها ڕۆیشتن بۆ مەنا و گەڕان بە دەوری «وداع»ی لەسەر پێویستە. پەیڤێکتر دەڵێ قوربانیکردنی مەڕ زۆر پێویست

نییە، بەڵام سوننەت ئەوەیە بەو چەشنەی بێژرا جێبەجێ بکرێ.

حەج بە سێ جۆرە: ئیفراد (یەکانە) و قیران (حەج و عومرە بە یەک ئیحرام)، تەمەتتوع (حەج و عومرە بە دوو ئیحرام).

**یەکانە** پێشترە: هەر وەکوو سەرەتا حەج بەجێدێنێ و پاشان ئیحرام دەردێنێ و ئینجا ئیحرامی عومرە دەبەر دەکا و عومرە بەجێ دێنێ و ئیحرامی عومرە لە «جعرانە» و «جعرانە» لە «تنعیم» و «تنعیم» لە «حدیبیّە» هێژاترن.[1]

**قران**- (حەج و عومرە بە یەک ئیحرام)، ئەوەیە کە دەڵێ: «لَبیکَ بحجةٍ وَ عُمرَةً» تا بە یەکجار بە هەردوویان مەحرەم بێ و کردەکانی حەج بەجێ بێنێ و تەواو؛ تا عومرەشی بۆ بنووسرێ، هەروەکوو دەسنوێژ لە غوسڵدا. هەرکەس ئەمەی کرد، قوربانکردنی مەڕێکی لەسەر پێویستە، مەگەر ئەوەی خەڵکی مەککە بێ، کەوابوو لەسەری پێویست نییە، چونکە زێدی وی مەکەیە. ئەوەی قیران بەجێ بێنێ و پێش وەستان لە عەرەفەدا تەواف کا و تێبکۆشێ، حەج و عومرەی بۆ دەنووسرێ. بەڵام تەواف پاش عەرەفە دەبێ دووپاتە بکرێتەوە؛ چونکە مەرجی تەواف ئەوەیە کە پێش وەستان لە عەرەفەدا بێ.

تەمەتتوع- (حەج و عومرە بە دوو ئیحرام): ئەوەیە کاتێ گەیشتە ژوانگە (میقات)، ئیحرامی عومرە دەبەرکا و پاش ئەوە کە دەڕواتە مەکە، بیگۆڕێ، تا لە گیرۆدەی ئێحرامدا نەبێ. پاشان لە کاتی حەجدا، دیسان بڕواتە مەکە و ئێحرامی حەج دەبەر کا و لەسەری پێویستە مەڕێک بە قوربان کا، ئەگەر پێی نەکرا، تا بەر لە جێژن، سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرێ -بێمەودا یان بە مەوداوە- و کە گەیشتەوە زێدەکەی خۆی حەوت ڕۆژیتر ڕۆژوو بگرێ. بۆ دوو حەج بە یەک ئێحرامیش (قیران) ئەگەر مەڕی نەبوو، دەبێ دە ڕۆژ بەڕۆژوو بێ.

قوربانیکردنی تەمەتتوع لەسەر کەسێک پێویستە کە ئێحرامی عومرەی لە شەووال یان زولقەعدە یاخۆ دە ڕۆژی سەرەتای زولحەججە دەبەر کردبێ، تا زەحمەتی حەجی کەمتر بێ و ئێحرامی حەجی لە ژوانگەی خۆدا داکەندبێ. کەواتە ئەگەر مەککی یاخۆ نامۆ بێ و لە کاتی حەجدا هاتبێتە ژوانگە (میقات) و میلێک مەودای بێ، مەڕێکی لەسەر پێویستە.

**نەهی لێ کراوەکانی حەج** شەشن:

**یەکەم** جلوبەرگ کردنە بەر؛ چونکە لە ئیحرامدا گجی و سەروێن و پاتۆڵ و شەکاڵ دەپێ ناکرێ.

---

[1]- جعرانە، تنعیم و حدیبیّە، سێ شوێنن کە حاجیان لەوێدا بەرگی ئیحرام دەبەر دەکەن.

بەڵکوو تەنیا بۆی هەیە فۆتە و باڵاپۆش و سۆڵێ لە پێ کا، ئەگەر سۆل نەبوو، دەتوانێ پاڵا لە پێ کا، ئەگەر فۆتەی نەدیەوە، دەتوانێ پاتۆڵ لە پێ کا. دەتوانێ هەموو لەشی بەفۆتە داپۆشێ، بێجگە لەسەری کە دەبێ رووت بێ. ئافرەتان دەتوانن بەرگی ئاسایی خۆیان لەبەرکەن و دەتوانن لە نێو کەژاوەش دابنیشن.

**دووەم**- بۆن و بەرامەی خۆش لە خۆ نەدا. ئەگەر دای دەبێ مەڕێک بە قوربان کا.

**سێیەم**- سەرنەتاشێ و نینۆک کورت نەکاتەوە؛ ئەگەر کردی، دەبێ مەڕێک بکاتە قوربانی. دەتوانێ بڕواتە حەمام، هەجامات کا و پرچی دابێنێ؛ بە مەرجێک مووی لێ نەبێتەوە.

**چوارەم**- توخنی ژنان نەکەوێ، ئەگەر کەوت دەبێ حوشترێک، یان گایێک یاخۆ حەوت سەر مەڕ بکاتە قوربان، هەروەها حەجەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و دەبێ بە قەزا بەجێی بێنێ. ئەگەر پاش ئێحرام داکەندنی هەوەڵ بوو، حەج بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام دەبێ حوشترێک بکاتە قوربان.

**پێنجەم**- دەسپێکی تێکەڵبوون دەگەڵ ژنان -وەکوو ramووسان و لەکۆش گرتن- رەوا نییە و هەرچی دەسنوێژ بشکێنێ لە دەسبازی نارەوایە و کە کەسێک کردی دەبێ مەڕێک بکاتە قوربان؛ بۆ شاوەت هێنانەوەش هەروایە. کەسێک کە لە ئێحرامدا بوو، ناتوانێ مارە ببڕێ، کە کردی، مارەیی نایە و هیچ ئەرکێک ناخرێتە ئەستۆی کەس.

**شەش**- هیچ شتێک نابێ راو بکرێ، مەگەر ئەوەی کە ئاوژی بێ. ئەگەر شتێکی راو کرد، دەبێ شتێکی هاوسەنگی -لە حوشتر و گا و مەڕ- بکاتە قوربانی.

## چۆنییەتی حەج کردن

پێویستە سەرلەبەری دانستەکان و کردەوەکانی حەج بزانێ، لە فەرز و سوننەت، بەو چەشنەی کە سوننەتە؛ چونکەی ئەوەی بە پێی خوو و عادەت عیبادەت نەکا، داب و سوننەت و فەرزی لەلا چوون یەکە و کە گەیشتە پاگەی خۆشەویستی، دەگاتە نەوافل و سوننەتەکان. هەروەکوو پێغەمبەر گوتی کە خودا فەرموویە: «بەندەکانی من بە هیچ شتەک وەکوو بەجێهێنانی فەرزەکانیان لە من نزیک ناکەون. ئەوەی کە بەندەی من بێ، لە بەجێهێنانی سوننەت و نەوافیل ناحەسێتەوە، تا ئەو دەم کە گوێ و چاو و دەست و زمانی هەر من بم: بە من دەبیسێ، بە من دەبینێ، بە من رادەگرێ و بە من دەپەیڤێ». کەواتە گەلێک گرینگە داب و نەریت و سوننەتەکانی پەرستن بەجێهێنان و لە هەموویان تێگەیشتن.

**نەریت و پێداویستەکانی رێگا**- دەبێ سەرەتا نییەتی حەج بێنێ و لە گوناحەکانی پاشگەز بێ و زولمی لە هەرکەس کردووە، قەرەوی کاتەوە و قەرزەکانی بداتەوە و خەرجوبەرجی ژن و منداڵ و

ئەوەی خەرجی لەسەر ئەوە، بە تەواوی دایبنێ و راسپێرەکانی بنووسێ و زادی رێگا لـە مالـی پـاکژ و خاوێن وەلا بنێ و لە هەر لێلییەک خۆ ببوێرێ؛ چونکە ئەگەر بـە مالـێ حـەج بـەجێبێنـێ کـە لێـی دڕدۆنگ بێ، رەنگە حەجی لێ وەرنەگیرێ. ئەوەندە تۆیشوو دەگەڵ خۆ ببا کە بتوانێ لەگەڵ هـەژاران لەسەر یەک سفرە بێ. بەر لـە کەوتنـە رێ، بـۆ دووری لـە بـەلا و کارەسـاتی رێ، سـەدەقەی بـدات؛ ئێسترێکی بەهێز بگرێتە کرێ. کەل و پەلی رێگا پیشانی چارودار بدا تا لە رێگادا هەست بـە دڕۆنگـی نەکا. هەڤالێکی مێرخاس و رێزان و گەڕیدە ببینێتەوە تـا هـەم لـە کـاری دیـن و هـەم کـاری دونیـا یاریدەر و ئاریکاری بێ. لە دۆست و خزم و یارانی مالاوایی کا و داوای لێبوردنیان لێ بخوازی و پێیـان بلێ: «اَستَودِعُ اللهَ دینَکَ وَ اَمانَتَکَ وَ خوایِمَ عَمَلِکَ[1]» ئەوانیش پێی بڵێن: «فـی حَفـظِ اللهِ وَ کَنَفِـهِ زَوَّدَکَ اللهُ التَّقوی وَ جنَّبَکَ الرَّدی وَ غَفَرَ ذَنبَکَ وَ وَجهَکَ لِلخیرِ اَینَما تَوَجَّهتَ[2]».

ویستی لە خانی بێتە دەر، سەرەتا دوو رەکات نوێژ بخوێنێ: لە رەکاتی یەکەم دا «اَلْحَمْدُ لِلّه و قُلْ یـا اَیُّهَا الْکافِرُون» و لە رەکاتی دووهەمدا «اَلْحَمْدُ لِلّه و قُلْ هُوَ اللهُ اَحَد» بخوێنێ. پاش دوایـی هێنـانی بـلێ: «اَللّهُمَّ اَنتَ الصّاحِبُ السَّفَرِ وَ اَنتَ الْخَلیفةُ فِی الأَهْلِ وَ الْمالَ وَالْوَلَد، اَحْفَظْنا وَ اِیّاهُمْ مِنْ کُلِّ آفَـة. اَللّهُـمَّ اِنّـا نَـسْأَلُکَ فی مَسیرِنا هذَا البِرَّ وَالتَّقوی وَ مِنَ العَمَلِ ما تَرْضی»[3].

کە گەیشتە بەر دەرکە بلێ: «بِسْمِ اللهِ، تَوَکَّلتُ عَلَی اللهِ، لاحَـولَ وَ لاقـوَّةَ اِلاّ بـاللهِ، اَللّهُـمَّ بِـکَ انتَـشَرتَ وَ عَلَیکَ تَوَکَّلْتُ وَ بِکَ اعتَصَمتُ وَ اِلَیکَ تَوَجَهـتُ. اَللّهُـمَّ زودْنـی التَّقـوی وَاغْفِرلـی ذَنْبـی وَ وَجْهنـیَ لِلْخَیـرِ اَیْنمـا تَوَجَّهْتَ»[4].

کە سواری چارەوا بوو بـلێ: «بِسْمِ اللهُ وَ بِاللهِ وَ اللهُ اَکْبَر[5]، سُبْحانَ الّذی سَخَّرَ لَنا هذا وَ ما کُنّا لَـهُ مُقْـرِنینَ وَ اِنّـا

---

١- دین و ئەمانەت و دەرەنجامی کردەوەت بە خوا دەسپێرم.

٢- لە پەنای خوا بی! پەروەردگار پارێزکاری کاتە توێشووت و لە خراپەت بپارێزێ و لە گوناحت خۆش بێ و رووت لە هەر کوێ نـا، بەختەوەر بی.

٣. خوایا تۆ خێوی سەفەر و جێنشینی سەفەرکردووانی لە نێو کریف و خێزانیاندا، ئێمە و ئەوان لە پەنای خـۆت راگـرە و لـە هـەر کارەهاتێکمان بپارێزە. خوایا! لێت دەخوازین مێرخاس و چاکەکار بین و ئەو کارەمان لێ بۆمشێتەوە کە خۆت پێت خۆشە.

٤. بەناوی خودا، خۆم سپارد بە خوا، هیچ هێز و ورەیەک بێجگە لە خوا نییە، خوایا! بە هیوای تۆوە لە کریڤم دوور کەوتم و دڵم بـە تۆ ئەسپارد و هانام بە تۆ برد و رووم لە تۆ نا. خوایا! پارێزکاریم بکە بـە توێـشوو و لـە گوناحـانم خـۆش بـە و رووم لـە هـەر کـوێ نـا بەختەوەرم کە.

٥. بەناوی خوا، سوێند بە خودا و خوا گەورەیە.

الیَ رَبِّنا مُنقَلبوُن»[1]. لە ڕێگادا خەریکی یادی خودا و قورئان خوێندن بێ، کە گەیشتە هەورازێ بڵێ: «اَللّٰهُمَ لَکَ الشّرَفُ عَلی کُلِّ وَ لَکَ الْحَمْدُ عَلی کُلِّ حالٍ[2]». کە مەترسییەک لەرێدا بوو، «ئایەتولکورسی وَ شَهِدَ اللهُ[3] و قُلْ هُوَ الله و مُعَوذَّتَین[4]» بخوێنی.

**نەریتی ئیحرام بەستن و چوونە نێو مەککە** - کە گەیشتە ژوانگە (میقات) چونکە کاروان لەوێدا ئیحرام دەبەستن، سەرەتا خۆی دەشوا و سەری دەتاشێ و نینۆکی کورت دەکاتەوە -هەروەک بۆ هەینی بێژرا- و بەرگی دووراو دادەکەنێ و فۆتە و بالاپۆشێکی سپی بەخۆدا دەئالێنێ. بەر لە ئیحرام بەستن دەتوانێ بۆن و بەرامەی خۆش لە خۆ بدا. کاتێ هەستا بۆ ڕۆیشتن، حوشترەکەی هێز بدا و روو لە ڕێگا بکەوێتە ڕێ و نییەتی حەجی بێنی -بە دڵ و زمان- پاشان بڵێ: «لَبَّیکَ، اَلّهُمَّ لَبَّیکَ، لاشَریکَ لَکَ لَبَّیکَ، انَّ الْحَمْدَ وَ النِّعْمَةَ لَکَ وَالْمُلْک، لا شَریکَ لَک»[5] ئەم پەیڤانە بە دەنگی بەرز بڵێتەوە، لە هەر هەورزا و نشێوێکدا، لە هەر کۆسپ و ئاستەنگێکدا. کە گەیشتە مەککە خۆی بشوا.

**لە حەجدا نۆ شت غوسلی سوننەتی لە سەرە**: ئیحرام بەستن، چوونە نێو مەککە، سووڕانەوە بۆ زیارەت، راوەستان لە عەرەفات، گەیشتنە «مزدلفە» سێ غوسل بۆ بەرد هاویشتن بۆ سێ جەمەرە[6] و سووڕانەوەی مالاوایی. بەردهاویشتن بۆ جەمەرەی دوایی، غوسلی ناوێ.

پاش ئەوەی کە خۆی شۆرد و ڕۆیشتە نێو مەکە و چاوی بە ماڵی خودا کەوت و هێشتا لە نێو شاردا بوو، دەبێ بڵێ:«لا الهَ الاّ الله و اللهُ اَکبَر. اَلّهُمَّ اَنتَ السَّلامُ وَ مِنْکَ السَّلامُ، و دارُکَ دارُالسّلام، تَبارَکْتَ یا ذَالْجَلالِ وَالْاکرام. اَللّهُمَّ انَّ هذا بَیْتُکَ عَظَّمْتَهُ وَ کَرَّمْتَهُ وَ شَرَّفْتَهُ. اَللّهُمَّ فَزِدهُ تَعْظیماً وَ تَشْریفاً وَ تَکْریماً وَ زِدْهُ مَهابَةً وَ زِدْ مَنْ حَجَّهُ بِرّاً وَ کَرامةً. اَللّهُمَّ افتَحْ لِی اَبْوابَ رَحْمَتِکَ وَ اَدْخِلْنی جَنَّتَکَ وَ اَعِذْنی مِنَ الشَّیطانِ الرَّجیمِ»[7].

---

۱. قورئان (۱۳/٤۳ و ۱٤) پاکی و بێعەیبی بۆ ئەو کەسەیە کە ئەمەی رامی ئێمە کرد؛ دەنا بۆمان رام نەدەبوون. ئێمەش گشتمان بەرەو پەروەردندەی خۆمان دەچینەوە (هـ)

۲. خوایا! بەرزتری لە هەموو بەرزان، هەردەم سپاس و پێزانین بۆ تۆیە.

۳ . قورئان ۲۵۵/۲ و ۱۸/۳.

٤. قورئان ۱۱۲ و ۱۱۳ و ۱۱٤.

٥- گوێ لە مستم، خوایا گوێڕایەڵم، لە بەندەگیتدا کەس شەریک نییە، سوپاس و بەزەیی و پادشایی هەر هی تۆیە، بێ شەریکی.

٦ - سێ جەمەرە: سێ جێگایە لە «منی»دا کە پێیان دەڵێن «جمره الاولی» و «جمره الوسطی» و «جمره العقبی».

۱- بێجگە لە «الله» خوایەک نییە، خوا گەورەترینە. خوایا تۆ سەلامی و سەلام لە تۆیە، خانووی تۆ جێگای هێمنی و ئاسایشە، ئەی بەرز و پرشکۆ! تۆ پیرۆزی. خوایا! ئەمە خانی تۆیە کە بەرز و پرشکۆت کردووە، خوایا گەورەیی و هێژایی پتر کە، قەدر و حورمەتی لە زیاد بوون بێ و خێر و چاکە ببارێنە بە سەر زیارەتکارانیدا. خوایا دەرگای رەحمەتت بە سەرماندا بکەرەوە لە بەهەشتدا و ڕێمان بدەو لە دەست شەیتانەوە هانا بە تۆ دەبەم.

پاشان بڕواتەنێو مزگەفتەوە -لە درگای بەنی شەیبەوە- بە مەبەستی ڕۆیشتنە لای بەردی ڕەشەوە و ڕاموسانی؛ بەلام گەر بە هۆی قەرەباڵغییەوە پێی نەکرا، دەستی بۆ بەرز کاتەوە بڵێ: «اَللّٰهُمَّ اَمَانَتِي اَدَّيْتُها وَ ميثاقي تَعَاهَدْتُهُ اَشْهِدْ لِي بالموافاه[2]». پاشان خەریکی تەواف و سەعی بێ.

**نەریتی گەڕان و تەواف**- گەڕان وەکوو نوێژە: لەمەشدا پاک و خاوێنی لەش و جلوبەرگ و شوێن و داپۆشانی شەرمگا پێویستە؛ بەلام لە تەوافدا قسە کردن ڕەوایە.

سەرەتا دەبێ سوننەتی «اضطباع» بە جێ بێنێ. ئەوەش بریتییە لەوەی کە ناوەڕاستی فۆتەکەی لە بن هەنگەڵی نێ و هەر دوو سەری فۆتەکە بەسەر شانی چەپیدا بدات. سەرێک لە فۆتەکە لەسەر سنگیدا و ئەو سەری بەرووی پشتێدا بداتە سەر شانی چەپیدا.پاشان لە بەردی ڕەشەوە خەریکی گەڕان بێ بە چەشنێک ماڵەکە لە لای چەپیەوە بێ و مەودای نێوانیان کەمتر لە سێ هەنگاو نەبێ، تا پێ لەسەر بنەڕەتی ماڵەکەدا نەنێ، چونکە ئەو بەشە وەکی نێو خانووەکە وایە. کە گەڕانی دەست پێ کرد، دەبێ بڵێ: «اَللّٰهُمَّ ايماناً بِکَ وَ تصديقاً بِکتابِکَ وَ وَفاءً بِعَهْدِکَ وَ اَتباعاً لِسُنَّة نَبِيِّکَ مُحَمَّدً صَلَّى اللهُ عَلَيْهَ وَ سَلَّمَ[2]».

کە گەیشتە بەر دەرگای ماڵی خودا، بڵێ «اَللّٰهُمَّ هذاالْبَيْتُ بَيْتُکَ الْحَرَامُ، وَ هذا الحَرَمُ حَرَمُکَ، وَ هذا الْاَمْنُ اَمْنُکَ وَ هَذَا مَقامُ الْعائذُ بِکَ مِنَ النَّار[3]».

کە گەیشتە ئەستوونی عەراقی بڵێ:

«اَللّٰهُمَّ اِنِّي اَعوذُ بِکَ مِنَ الشِرْکِ وَالشَّکِّ وَالْکُفْرِ وَ النِّفاقِ و سوءِ الْاَخْلاقِ وَ سوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْاَهْلِي وَ الْمالِ وَ الْوَلَد[4]».

کە گەیشتە هەمبەر بلوورەکەوەبڵێ:

«اَللّٰهُمَّ اَظِلَّنِي تَحْتَ عَرْشِکَ يَوْمَ لاظِلُّ عَرْشِکَ. اَللّٰهُمَّ اَسْقِنِي بِکَاْسِ مُحَمَّدا عَلَيْهِ السَّلاَم شَرْبَةً لا اُظْماُ بَعْدَها

---

٢- پەروەندەم! ئەمانەتی خۆم گەڕاندەوەو بڕیارێکدا دابووم، بەجێم هێنا؛ خۆت ئاگادار بە لە سەر بڕیارم بووم.

٣- خوایا! بڕوام پێتە و بڕوام بە کتێبەکەت هەیە و سەرم بۆ گفت و بڕیارت نەوی کردووەو بووەتە پێڕەوی سوننەتی پێغەمبەرت، موحەممەد.

٤- خوای! ئەم خانووە خانووی هێژا و پیرۆزی تۆیە و ئەم حەرەمە، حەرەمی تۆیە و ئەم هێمنییە، هێمنی تۆیە و ئێرە جێگای کەسێکە کە لە ئاوری دۆژەهانای بۆت هێناوە.

١. خوایا ! پەنات پێ دەبەم لەوەی کە کەسێکت بکەمە شەریک و لە گومان و کوفر و مەرایی و نزمی ئاکار و ڕەوشتی خۆم و کریف و منداڵ.

اَبداً [1]».

کە گەیشتە ئەستوونی شامی، بڵێ:

«اَللَّهُمَّ اجْعَلْهُ حَجاً مَبْرُوراً وَ سَعْياً مَشْكُوراً وَ ذَنْباً مَغْفوراً و تجارةً لَنْ تَبوُرَ يا عزيزُ يا غفوُر، رَبَّ اغْفِرْ وَ اَرْحَمْ وَ تَجاوَزْ عَمّا تَعْلَمْ، اَنَّكَ اَنْتَ الْاَعَزَّ الأَكْرَمْ [2]».

کە گەیشتە کۆڵەکەکەی یەمانی بڵێ: «اَللَّهُمَّ اِنِّی اعوُذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَ الْفَقْرِ وَ مِنَ الْعَذابِ الْقَبْرِ وَ فِتنةِ الْمحْيا و الْمَمات، وَ أعوُذُ بِكَ مِن مِنَ الْخَزْيِ فی الدُّنیا و الْآخرة [3]».

کە گەیشتە نێوان ئەم ئەستوونە و بەردی ڕەش، بڵێ: «اَللَّهُمَّ رَبَّنَا آتنا فِی الدُّنیا حَسَنَة وَ فِی الآخِرَةِ حَسَنَةً وَ قِنا بِرَحْمَتِكَ عَذابَ النَّارِ وَ عَذَابَ الْقَبْرِ [4]». دەبێ حەوت جار بەم چەشنە بگەڕێ و هەر جارەیش ئەم پەیڤانە بڵێتەوە. هەر جار سووڕانەوەیەک خولێکی پێ دەڵێن. سێ خولی بلەز دەڕوا، خێرا و ئازا. ئەگەر لە نزیک خانووەوە بۆی سەخڵەت بێ، نەختێکی لێ دوور بێتەوە تا خێراتر بتوانێ بڕوا. لە چوار خولی دواییدا نەختێ هێورتر بڕوا و هەر جار بەردی ڕەش راموسێ و دەست بۆ ئەستوونی یەمانی هەڵبڕێ؛ ئەگەر پێی نەکرا، بە دەست ئاماژەی بۆ بکا.کە حەوت خولەکەی دوایی هێنا، ئەمجار لە نێوان دەرگای خانوو و بەردی ڕەش رابوەستێ، سنگ و ورگ و لای راستی روومەتی یان بەسەر دیوار یاخۆ پەردەی دیوارەکەدا بنووسێنێ و هەر دوو دەستی بنێتە ژێر سەری. ئەم پێگە پێی دەڵێن «ملتزم» و دوعا و گازەی ئەم شوێنە بێ بەرسف نابێ و دەبێ بڵێ : «اَللَّهُمَّ يا رَبَّ الْبَيْتِ الْعَتيقِ، اَعْتِقْ رَقَبَتی مِنَ النّارِ وَ اَعِذْنِی مِنْ كُلِّ سوءٍ، وَ قَنِّعْنی بِمَا رَزَقْتَنی وَ بارِکْ لِی فیما آتَيْتَنی [5]». ئینجا سەڵوات بنێرێ و داوای لێبوردن لە پەروەردگار کا و نیازی دڵی بەخوا بڵێ.

پاش ئەمانە لە پشت ئەو پێگەوە راوەستێ و دوو ڕەکات نوێژ بخوێنێ: ئەم دوو ڕەکاتە پێی دەڵێن دوو ڕەکاتی تەواف و تەواف بەوە دوایی دێ: لە ڕەکاتی یەکەمدا سوورەی «اَلْحَمْد» و «قُلْ يا اَيُّهَا

---

٢. خوایا! لە سای عەرشی خۆتدا رامگرە، ئەو رۆژەی کە بێجگە لە سای عەرشی تۆ، هیچ پەنایەک نییە.

خوایا! بە دەفری محەممەد شەربەتێکم پێ بنۆشە، کەپاش ئەوە قەد تینوێتی نەناسم.

٣. خوایا! ئەم حەجەم حەجێکی وەرگیراوە و کۆشەوەیەکی مل کەچانە و گوناحێکی بەخشراوە و مامەڵەیەکی بێ‌خەسار بێ، ئەی هێژای گوناح‌بەخش.

٤. خوایا! پەنات پێ دەبەم لە کوفر و هەژاری و ئازاری گۆڕ و پشێوە و ئاژاوەی زیندوو و مردوو. پەنات پێ دەبەم لە سووک و پەستی دونیا و دوارۆژ.

٥. پەروەرندەم! لە دونیا و دوارۆژ چاکەمان پێ بدە و بە بەزەیی و دلۆڤانی خۆت لە ئازاری قەبر و ئاوری دۆزەخمان بپارێزە.

١. خوایا ! ئەی خودانی ئەم خانووە کەونە! لە داوی ئاورم دەربازکە، لە هەموو خراپەیەکم بپارێزە و لەوەی کردۆتە بەشم دڵم هێور کە و پێز و پیت بخە نێو ئەو خێرەی دەگەڵت کردووم.

الْکافُرُون» بخوێنێ و لە رەکاتی دووهەمدا « اَلْحَمْد » و «قُلْ هُوَ اللهُ اَحَد». پاش نوێژ دوعا بخوێنێ. تا حەوت خول نەهێنێتەوە، تەواف تەواو نابێ و دەبێ پاش حەوت خول، ئەم دوو رەکات نوێژەش بخوێنێ. پاشان بڕواتە نزیک بەردی رەشەوە و رایمووسێ و دوایی پێ بێنێ و خەریکی «سعی» بێ.

**نەریتەکانی سەعی**: دەبێ لە دەرگای سەفاوە بڕواتە دەر و چەن پلەیەک لە سەفا بڕواتە سەر، بەچەشنێک کە کەعبە ببینێ و روو لە کەعبە بڵێ:

«لا اِلَه الاَّ الله وَحْدَهُ لا شَریکَ لَهُ، لَهُ الْمُلْکُ وَ لَهُ الْحَمْدُ یُحْیی وَ یُمیتُ وَ هُوَ حَیّ لا یَموتُ، بِیَدِه الْخَیْرُ وَ هُوَ عَلی کُلِّ شَیءَ قَدیر.لا اِلَه الاَّ الله وَحْدَهُ وَ صَدَقَ وَ عْدَهُ وَ نَصر عَبْدَه واَعَزَّ جُنْدَهُ وَهَزَمَ الْاَحْزابَ وَحْدَهُ، لا اِلَه الاَّ الله مَخْلِصینَ لَهُ الدینَ ولَوْ کَرِهَ الکافرون[1]».

گازە بکا و نیازی خۆی بڵێتەوە. پاشان بێتە خوارەوە و سەعی یەکەم تا مەروە بەجێ بێنێ. سەرەتا بە کاوەخۆ بڕواو بەردەوام بڵێ:

«رَبِّ اغْفِرْ وَاَرْحَمْ وَ تَجاوَزْ عَمَّا تَعْلَمْ اَنَّک اَنْتَ الْاَعَزُّالْاَکْرَم، اَللّهُمَّ رَبَّنَا آتنا فِی الدُّنْیا حَسَنَةً وَ فِی الْاخِرةِ حَسَنَةً وَ قِنَا عَذابَ النَّار[2]». پاشان هەروا بە هێوری بڕوا تا دەگاتە ئەستوونی کەسک، کە لە سووچی مزگەفتایە، بەر لەوە شەش گەزێک بە پەلە بڕوا تا دەگاتە دوو ئەستوونی کەسکیتر. ئینجا بە هێواشی بێتە رێگا تا دەگاتە مەروە. لەوێ سەرکەوێ و روو لە سەفا راوەستێ و ئەم دۆعایە بخوێنێتەوە. کە گەڕاوە بۆ سەفا، دەبێتە دوو جار سەعی. هەر بەم چەشنەی بێژرا، حەوت جار بێت و بڕوا.

کە لەمەی بێژرا بووەوە، تەوافی«قدوم» و «سعی» بەجێ بێنێ. ئەمە لە حەجدا سوننەتە. بەڵام ئەم تەوافەی کە سەرەکییە، پاش گەیشتنە (وقوف).

تارەت هێنان لە سەعیدا سوننەتە و لە تەوافدا پێویستە. بۆ بەجێهێنانی سەعی، هەر ئەمە بەستە و مەرج نییە کە پاش وەستان (وقوف) بەجێبهێنرێ. بەڵام دەبێ پاش تەواف بەجێ بێ، هەرچەند ئەو تەوافەش سوونەت بێ.

---

٢. بێجگە لە ئەڵلا خوایەک نییە، تاقانە و بێ شەریکە، هەر خـۆی پادشـایە و شـیاوی پەرسـتنە، زینـدوو کـەرەوە و مرێنـەرە، خـۆی زیندووی هەتاهەتایە، چاکە بەدەستی ویە و بە سەر هەموو شتدا زاڵە، بێجگە لە ئەو خوایەکتر نییە، بڕیارەکانی راست و بـێ گـرێن، هەر خۆشی ئاریکارە. لەشکری بەهێزترینە، بە تاقی تەنێ هەمووان تێک دەشکێنێ، بێجگە لەو خودایە نییە، بـڕواداران بـەپاکی دیـنی ئەویان قبوول کرد، هەرچەندە کافرەکان پێیان خۆش نەبوو.

٣. پەروەرندەم ببەخشە و ببوورە، لەوەش خۆت دەیزانێ تێپەڕە، تۆ هێژا و دەهەندەی. خوایا! لە دونیا و پەسلاندا چاکەمان پێ بـدە و لە ئاوری جەحەننەم بمانپارێزە.

**نەریتەکانی گەیشتن بەعەرەفە:** ئەگەر کاروانێک رۆژی عەرەفە گەیشتە عەرەفات، خەریکی تەوافی «قدوم» نابن، بەڵام ئەگەر پێش لە رۆژی عەرەفە گەیشتنە عەرەفات، بەجێی دێنن و رۆژی «ترویه[1]» لە مەکە دێنەدەرەوە و ئەو شەوە لە مەنا دەمێننەوە و بەیانیەکەی دەڕۆنە عەرەفە. کاتی گەیشتنی عەرەفە، پاش خۆرئاوا، تا خۆرهەڵاتی دوارۆژە. ئەگەر پاش بەیانی گەیشتنە بەرەوە، حەجەکەیان فەوتاوە. رۆژی عەرەفە خۆ دەشۆن و نوێژی نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە دەخوێنن، تا خەریکی دوعا و گازە بن.

لەم رۆژەدا رۆژوو ناگرن با خوستیان لێ نەبڕێ و بتوانن زۆر دوعا و گازە بکەن: چونکە لە راستیدا راستەقینەی حەج ئاپۆرەی دڵ و هیممەتگەلی بەهێزە لەم کاتە بەرز و هێژایەدا. باشترین یاد لەم کاتەدا، پەیڤی «لا الٰه الاّ الله»یە. بە کورتی، دەبێ هەر لە خۆراواوە تا کوو نیوەشەو، خەریکی گریان و دوعا و نزا و سکاڵا بێ و بە یەکجاری لە گوناح و تاوان پاشگەز بێ و داوای لێبوردن کا لە پەروەردگار. دوعا بۆ ئەم ساتەوەختە، زۆروزەوەندە و وتنی هەموویان کاتی زۆر دەبا. لە کتێبی «احیاء علوم‌الدین»دا بە وردی بێژراوە، دەتوانن سەیری کەن. هەرچەن دوعاشتان لە بیر بوو، لەم کاتەدا گوتنی زۆر بەجێیە. ئەگەر هیچتان پێ لەبەر نەکرا، لەسەر پەڕی کاغەز بینووسنەوە و بیخوێننەوە، گەرواش نەبوو، دەبێ گوێ بۆ کەسێک رادێرن و ئەو هەرچی گوت، ئێوە بڵێن ئامین.

بەر لە ئاوا بوونی خۆر نابێ لە عەرەفات بێنە دەرەوە.

**نەریتەکانی‌تری حەج-** پاش عەرەفات بڕوا بۆ «مزدلفه»و پاشان خۆی بشوا؛ چونکە «مزدلفه» حەرەمە. نوێژی شێوان درەنگ بخوێنێ، یا خۆ دەگەڵ نوێژی خەوتنان پێکەوە بیانخوێنێ؛ بە یەک بانگی نوێژ و دوو ئیقامە. ئەگەر پێی بکرێ، با ئەو شەوە لە «مزدلفه» شەونخوونی بکێشێ و نەخەوێ و خەریکی نوێژ و سکاڵا بێ؛ چونکە لە ریزی عیبادەتەکانە. هەرکەس لەم شەوەدا شەونخوونی نەکێشێ، دەبێ مەڕێک بکاتە قوربانی.

لێرەدا دەبێ حەفتا وردە بەرد هەڵبگرێ تا بۆ «مەنا»ی بهاوێژێ؛ لێرەدا زۆرتر لەم بەردانەی بۆ پەیدا دەبن. نیوەشەو بڕواتە مەنا و نوێژی بەیانی لەوێ بەجێ بێنێ. کە گەیشتە دوایین جێی «مزدلفه» -ئەو شوێنەی «شعرالحرام»ی پێ دەڵێن- تا کازیوە دابنیشێ و خەریکی سکاڵا بێ. پاش ئەوێ، دەگاتە شوێنێ کە گەلێی «محسّر»ی پێ دەڵێن؛ لێرەدا لە وڵاخەکەی خێراتر بخوڕێ، ئەگەریش بە پیاسە دەڕوا، دەبێ پا هەڵگرێ و خێراتر بڕواو و پانتایی شیوەکە ببڕێ و بڕوا، چونکە

---

1. رۆژی هەشتی زیحەجە.

سوننەتە.

بەیانی جێژن، بە «لا الٰه الاّ الله» و لەببەیک گوتن دەکەوێتە رێ تا دەگاتە سەرەو ژوورێک کە «جَمَرات»ی پێ دەڵێن. لەوێ لە لای راستەوە هەڵدەزنێ، چونکە قیبلە لە لای راستی رێگایە و «جَمَرهُ الْعَقَبه»ی پێ دەڵێن تا هەتاو دەدا لە سەرووی رمب، ئەو دەم حەوت بەرد بخاتە نێو ئەم «جَمَره» و نەختێ لەولاتر روو لە قیبلە بەدەنگی بەرز تەکبیر بڵێتەوە.

هەر بەردێکی کە هاویشت بڵێ : «اَللّٰهُمَّ تصدیقاً بکتابک وَ اتباعاً لِسُنَّة نبیِّکَ مُحَمّدٍ[1]». پاش ئەوەی ئەمانەی بەجێ هێنا، واز لە گوتنی «تلبیه»و «تکبیر» دێنێ، مەگین پاش فەرزەکانی نوێژ کە تا هەلاتنی خۆر «لا الٰه الاّ الله» دەڵێ هەر بەم چەشنە تاکوو رۆژی چوارەمی جێژنی قوربان. پاشان دەگەڕێتەوە مەنزڵگای خۆی و خەریکی دوعا و سکالا دەبێ. ئینجا گەر ویستی، قوربانی دەکا، بەلام دەبێ داب و نەریتەکانی قوربانی بە تەکووزی جێبەجێ کا؛ هەروەها دەبێ سەری بتاشێ. کە لەم رۆژەدا بەردی هاویشت و سەری تاشی، جارێک لە کەفارە دێتە دەرەو هەموو ئەو شتانەی لێی قەدەغە کرابوون، بۆی حەلال دەبن، بێجگە لە پێوەندی ژن و مێردی و راو.

پاشان دەگەڕێتەوە مەککە و بە دەوری ئەستووندا دەگەڕێ، کاتەکەشی پاش نیوە شەوی جێژنە؛ باشتر و بەدەوتر ئەوەیە کە رۆژی جێژن بە جێی بێنێ. دوایین کاتی خویان نییە، هەرچەند دەبێ ئەوەندە درەنگ کا کە تەوافەکەی نەفەوتێ، بەلام ئیدی لە کەفارە دەرناچێ و پێوەندی ژن و مێردیش حەرام دەمێنێ.

کە ئەم تەوافەشی وەکوو ئەوەی لە تەوافی «قدوم»دا بێژرا بەجێ هێنا، حەجەکەی دوایی دێ و راو و نزیکیش بۆی حەلال دەبێ. ئەگەر پێشتر «سعی» بەجێ هێنابێ، پێویست نییە جارێکیتر بەجێی بێنێ.

ئەگینا «سعی» ئەستوون پاش ئەم تەوافە بەجێ دێنێ. کە بەردی هاویشت و سەری تاشی و تەوافی کرد، حەج دوایی دێت و لە ئیحرام دێتە دەر.

بەلام بەردهاویشتن لە رۆژانی جێژن و شەوانە لە کاتی نووستن، پاش هاتنە دەر لەئیحرام جێبەجێ دەکرێ. کە لە تەواف و «سعی» بووەوە، رۆژی جێژن دێتە «منا» و ئەو شەوە لەوێ دەمێنێتەوە؛ ئەم شەونخوونیە فەرزە و بەیانیەکەی غوسل دەکا و حەوت بەرد دەهاوێژێ بۆ «جمره»ی پێشوو کە لە لای عەرەفاتەوەیە. روو بە قیبلە رادەوەستێ و دوعا دەخوێنێ، بە قەدەر

---

[1]. پەروەردگارم! بۆ سەلماندنی بروام بە کتێبی تو و پیرەوی لە سونەتی پێغەمبەرت موحەممەد، وا دەکەم.

سوورەی بەقەرە. پاشان حەوت بەرد دەهاوێژێتە نێو «جمرە»ی ناوەندی و دیسان دوعا و سکالا دەکا، ئەوسا حەوت بەردی‌تر بۆ «جمرە»ی دوایی دەخا. ئەو شەوە لە «منا» دەمێنێتەوە. ڕۆژی سێهەمی جێژنیش بە هەمان شێوە، بیست و یەک بەرد دەهاوێژێ. ئەگەر پێی خۆش بێ دەتوانێ هەر بەمە دوایی بێنێ و بگەڕێتەوە مەکە. ئەگەر تا خۆرئاوا لەوێ مایەوە،مانەوەی ئەو شەوە، هاویشتنی بیست‌ویەک بەردی‌تری لەسەر پێویستە.

## چۆنییەتی عومرە

که ویستی عومرە بەجێ بێنێ، سەرەتا غوسڵ دەکا، بەرگی ئیحرام دەبەر دەکا، هەر بەو جۆرەی حەجی دەکرد. ئینجا لە مەککە دێتە دەرەوە تا دەگاتە ژوانگە(میقات)، کە بریتییە لە «جعرانە» و «تنعیم» و «حدیبیە[1]». نییەتی عومرە بێنێ و بڵێ: «لَبّیکَ بِعُمْرَةٍ». ئینجا بڕواتە نێو مزگەفتی عایشە و دوو ڕەکات نوێژ بخوێنێ. دیسان بگەڕێتەوە بۆ مەککە و لە ڕێگادا بەردەوام «لبیک» بڵێ. کە گەیشتنە نێو مزگەفت واز لە لەبەیک گوتن بێنی و هەر وەک لە بەشی حەجدا بێژرا، تەواف و «سعی» بەجێ بێنێ. پاشان سەری بتاشێ و بە عومرەکەی دوایی بێنێ.

ئەمە لە هەر کاتێکی ساڵدا بێ، دەتوانێ بەجێی بێنێ. ئەوەی لەوێ بێ، دەبێ تا بۆی دەکرێ عومرە بەجێ بێنێ، ئەگەر نەیتوانی تەواف کا و ئەگەر ئەوەشی پێ نەکرا، سەیری خانییەکەی خودا کا. کە ڕۆیشتە نێو کەعبەوە، لە نێوان دوو ئەستووندا نوێژ کا. بە پێخاوس بڕواتە دەرێ. تا دەتوانێ ئاوی زەمزەم بخواتەوە تا ورگی توند بێ؛ بە هەر مەبەستێ کە بیخواتەوە شیفای پێوەیە؛ پاشان بڵێ: «اَللّهُمَّ اجْعَلْهُ شِفاءً مِنْ کُلِّ سُقْمٍ وَ ارْزُقْنا الإخلاصَ والیقینَ وَالْمُعافاةَ فی الدَّنیا وَالاخِرة، بِرَحْمَتِکَ یا اَرْحَمَ الرّاحِمین[2]».

## تەوافی ماڵاوایی

که کاتێ گەڕانەوە گەیشت، سەرەتا بار و بنەی کۆ کاتەوە و پاش هەموو کارەکانی ماڵاوایی لە خانووی خودا کا، هەر بەو چەشنەی بۆ تەواف بێژرا، دەبێ هەروا کا. بەڵام ئەمجار دەبێ بە کاوەخۆ بڕوا و هیچ پەلە نەکاو دوو ڕەکات نوێژ بخوێنێ و پاشان بڕواتە «مُلْتَزَم[3]» و سکالای خۆی بکاو

---

١. ئەم سێ شوێنە لە دەرەوە شاری مەککەن و ژوانگەیان(میقات) پێ دەبێژن.

١- پەروەرندەم! بەم ئاوە دەردی دەردەداران دەرمان کە و پاکی و پاراوای و بڕوا و لەش ساغیمان لەدونیا و دواڕۆژ پێ ببەخشە، بە بەزەیی خۆت، ئەی دلۆڤانترینی دلۆڤانان!

٢- لە بەردی ڕەشەوە تاکوو دەرکی کەعبە چوار گەزە و مەودای نێوانی ئەم دووانەبەردی ڕەش و دەرکی ماڵ- پێی دەڵێن «ملتزم» (سەفەرنامەی ناسر خوسرۆ).

بگەڕێتەوە. دەبێ پشتاوپشت بگەڕێتە دواوە و هەروا سەیری خانییەکە کا، تا لە مزگەفت دێتە دەرەوە.

## سەردانی مەدینە

پاش ئەمانە دەبێ سەردانی شاری مەدینە کا؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی پاش مردنم سەردانی قەبرم کا، وەکوو ئەوەیە لە کاتی ژیانمدا سەردانی کردبێتم». دیسان فەرمووی: «ئەوەی سەفەری مەدینە کاو مەبەستی سەرەکی زیارەتی من بێ، لە لایەن پەروەردگارەوە مافێکی بۆ دەچەسپێ، ئەوەش ئەوەیە کە من دەبمە تکاکاری».

لە رێگای مەدینەدا دەبێ سەڵواتی زۆر بنێرێ. کە چاوی بە دیواری مەدینە کەوت بڵێ: «اَللَّهُم هَذَا حَرَمُ رَسولِکَ صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَ سَلَّم، فَاجْعَلْهُ لِی وِقَایَةً مِنَ النَّارِ وَ اَمَاناً مِنَ الْعَذابِ وَ سوءِ الحساب[1]».

سەرەتا غوسڵ کا و پاشان بڕواتە نێو مەدینەوە، بۆن و بەرامەی خۆش لە خۆ بدا و بەرگی پاک و سپی دەبەر کا و بەرێز و حورمەت و خۆ بەکەمگریەوە بڕواتە نێو شار و بڵێ:

«رَبِّ اَدْخِلْنِی مَدْخَلَ صِدْقٍ و اَخْرِجْنِی تَخْرَجَ صِدْقٍ وَ جْعَلْ لِی مِنْ لَدُنْکَ سُلْطَانُ نصیراً[2]». پاشان بڕواتە نێو مزگەوتەوە و لە بەرانبەر منبەردا راوەستێ. بە جۆرێک کە شانی راستی لە هەمبەر ئەستوونی منبەرەکەوە بێ، چونکە جێی راوەستانی پێغەمبەر ئەوێ بووە و ئینجا دوو رەکات نوێژ بخوێنێ. پاشان روو بە دیواری قەبر و پشت بە قیبلە راوەستێ و خەریکی زیارەت بێ. دەست بە دیواردا هێنان و راموسانی سوننەت نییە، بەڵکوو لە دوورەوە راوەستێ باشترە و پاشان بڵێ:

«اَلسَّلامُ عَلَیْکَ یا رَسوُلَ‌الله، اَلسَّلامُ عَلَیْکَ یا نَبِیَّ الله. اَلسَّلامُ عَلَیْکَ یا حَبِیبَ الله، اَلسَّلامُ عَلَیْکَ یا صَفْوَةَ الله، اَلسَّلامُ عَلَیْکَ یا اکرمِ وُلْدِ آدَم، اَلسَّلامُ عَلَیْکَ یا سَیِّدِ المرسلین، اَلسَّلامُ عَلَیْکَ یا خاتم النَّبیین وَ رَسوُلَ رَبِّ‌العالَمین. اَلسَّلامُ عَلَیْکَ و علی اصحابک الطَّاهِرین و ازواجِکَ الطاهرات، امهاتِ المؤمنینَ، جزاکَ الله، عَنّا اَفْضَلْ ما جَزی بنیاً عَنْ اُمَّتِه وَ صَلّی عَلَیْکَ کُلمّا ذَکرَک الذّاکِروُن وَ عَنْکَ الغافلوُن[3]».

---

[1]- خوایا! ئێرە حەرەمی پێغەمبەری تۆیە، بە هۆی ئەوەوە لە ئاوری دۆزەخ و عەزاب و حسێبی خراپ بمپارێزە.

[2] - پەروەرندەم! بێ خەوشانە بمبەرە نێو بازێرە و بێخوشانەش بمهێنە دەرەوە و لە لای خۆتەوە هێزێکی یاریدەرم بۆ بنێرە.

[3] - درودت لێ بێ ئەی نێدراوی خودا، درووت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا، درودت لێ بێ ئەی دۆستی خوا، درودت لە سەر ئەی بژاردەی خوا، دروودت لێ بێ‌ئەی هێژاترین فەرزەندی ئادەم، سلاوت لە سەر ئەی گەورەی پێغەمبەران، دروودت لێ ئەی دوایین کەسی پێغەمبەران، ئەی نێردراوی پەروەرندەی جیهان، سلاو لە خو- و یارانی پاکت، لە هاوسەرانی پاک داوێنت دایکانی برواداران – خوا لەلای ئێمەوە پاداشێکت بداتێ هێژاتر لە هەر پاداشێ کە ئومەتێک بیدەنە پێغەمبەریان. سلاوت لێ بێ، لەو کاتانەی کە یادت دەکەن، یا ئەو کاتانەش کە یادت ناکەن.

ئەگەر پێیان راسپاردبێ سڵاو بگەیەنێتە پێغەمبەری خوا، دەبێ بڵێ :

«اَلسَّلامُ عَلَيْکَ مِنَ فلان، السلام عليمن من فلان». پاشان چەن گەز بڕواتە بەرەوە و لە ئەبووبەکر و عومەر سڵاو کا و بڵێ.

«اَلسَّلامُ عَلَيْکُما يا وزيرَیْ رَسوُلِ الله، والمعاونینْ لَهُ علی القيام بالدّين مادام حَيّاً، والقائمیْنِ فی اُمّته بَعْدَهُ بِاُموُرِالدّين، تَتَّبِعانِ فی ذالکَ آثارهَ، و تَعْمَلان بِسُنَّته، فَجَزا کَمَاخَيْرَ مَا جَزیَ وزْراء نَبیَّ عَلی دينه[1]».

پاشان هەر لەوێ راوەستێ و تا بۆی دەکرێ دوعا و سکاڵا کاو ئینجا بێتە دەرەوە و بڕوا بۆ گۆڕستانی بەقیع و سەردانی مەزاری یارانی پێغەمبەر و گەورەکانی دین کا. لە گەڕانەوەدا جارێکیتر زیارەتی پێغەمبەر کا و ماڵاوایی کا و بێتە دەرەوە.

## نهێنیەکانی حەج

ئەوەی بێژرا حەج بوو. لە هەر یەک لەم کارانە نهێنیەک بەرپێوارە و مەبەست لێی پەند و ئامۆژگاری و یادکردنی پەروەردگارە و فێرکردنی کارێکە لە کارەکانی دوارۆژ.

راستیەکەی ئەوەیە کە مرۆڤ بە چەشنێ خولقاوە کە بەوپەڕی بەختەوەری خۆی نەگات، تا بەو جۆرەی لە سەردێڕی موسوڵمانیدا راڤە کرا، ئیرادەی خۆی لە دەست نەدا و پەیڕەوی لە ئارەزووەکانی نەفس، نەبێتە هۆی فەوتاندنی: تا بە ویست و داخوازی خۆی بجووڵێ و ئەوەی دەیکا لادان لە فەرموودەی شەرع نەبێ و رەدووی هەواو هەوەس نەکەوێ. بەختەوەری مرۆڤ لە بەندەگیدایە. بەم بۆنەوە بوو کە دینەکانیتر گوتیان با پیاوانی ئایین و دین لە جەماوەر و کۆمەڵگا دابڕێن و لە کونجێکدا یا خۆ لە شاخ و ئەشکەفتێک خەریکی پەرستنی پەروەردگار بن. لە پێغەمبەریان پرسی: «دوورەپەرێزی و گەڕان لەم دینەدا نییە؟» فەرمووی: «جەهاد و حەجیان لە بری ئەوانە پێ داوم». کەواتە پەروەردگار حەجی لە باتی دوورەپەرێزی دایە ئەم ئۆمەتە، چونکە لە حەجدا هەم پاکژکردنی دەروون هەیە و هەم مەبەست و بابەتیتر، بۆیە خودا کەعبەی هێژا و خۆشەویست کرد و کردییەماڵی خۆی و چوارتەنشتی کردە حەرەم و نێچیر و دار و دەوەنی ئەم دەڤەرەی لە هەمووان حەرام کرد و عەرەفاتی وەکوو گۆڕەپانی لە پێش دەرگانەی پادشایان، لەبەر حەرەمدا دانا، تا لە هەموو کونج و قوژبنی دونیاوە روو لە وێ نێن و هەرچەند باش دەزانن پەروەرێنەریان بە دوور لەوەیە بێتە خوارەوە و لە نێو خانوویەکەدا بژی و پاک و پاراو لەوەیە کە لە

[1] - سڵاو لە ئێوە ئەی دوو وەزیری پێغەمبەری خودا! ئەی دوو دەستیاری ئەو لە پەرژانە سەر کاری دیندا لەو کاتەیدا کە زیندوو بوو. ئەی کەسانێک کە پاش ئەو کارو باری دینتان لە نێوان موسوڵمانان و رێڕەوانی رێگای ئەو و پێڕەوان لە سوننەتی ئەو، رێک و پێک کرد. پەروەردگاری پاداشێکتان پێ بدات کە هێژاتر بێ لە پاداشی هەموو وەزیرانی پێغەمبەرانیتر.

شوێندا بگونجێ، بەڵام چونکە شەوق و زەوقی گەیشتنە پەرای پەروەردگار زۆروزەوەندەیە، هەرچی ناوی یاری لێ ببرێ هێژاو دەلالە.

کەواتە، موسولمانان لە بری ئەم حەز و داخوازە، ماڵ و منداڵیان بەجێهێشت و ڕێگای پڕ لە درک و داڵیان هەڵبژارد و روویان لە کەعبە نا. لەم پەرستنەدا هەندێ کاریان لەسەر فەرز کرا کە ئاوەز هیچی لێ ناگا؛ وەکوو بەردهاویشتن و غاردان لە نێوان سەفا و مەروەدا، چونکە هەرچی ئاوەز لێی بگا، نەفسیش دزەی تێدا دەکا. هەروەک دەزانێ لە زەکاتدا بەزەیی هاتن بە هەژاران، لە نوێژدا خۆ خوار گرتن لە هەمبەر پەروەردگار و لە ڕۆژوودا بەزاندن و شکانی لەشکری شەیتان دانراوە، تا بەشکوو هەست، گوێڕایەڵی پەروەرندەی بێ. ئەو پەڕی بەندەگی، ئەوەیە کە دەم و دەس پاش دەرچوونی دەستوور، جێبەجێ بکرێ. «رمی» و «سعی» لەم بابەتانەن کە تەنیا بە هۆی بەندەگییەوە بە ئەنجام دەگەن و جێبەجێ دەکرێن. بەم بۆنەوە بوو کە پێغەمبەر فەرمووی: لە حەجدا بە تایبەت بێژرا «لَبَّیکَ بِحَجَّةٍ حَقّاً وَ تَعَبُّداً و رِقّاً» بە حەج بێژرا خاکەساری و بەندەگی.

ئەمەش کە تاقمێک پێیان سەیرە کە مەبەست لەم کردەوانە چییە، هۆی نەزانی ئەو کەسانەیە لە راستەقینەی ئەو کارانە. مەبەست لەم کردەوانە، بێ مەبەستییە و تەما، بێ تەمایی؛ تا بەندەگی خۆی بەم چەشنە بسەلمێنێ و بیری بێجگە لە لای جێبەجێکردنی دەستووری پەروەردگار، بە لای چیترەوە نەبێ. ئاوەز و هەست لەم چێژە هیچ بەش نابەن، مەگین ئەوەی کە ئەو شتەی کە کردوویانەتە کۆتی دەست و پێ، فریی دەن و چشی لێ بکەن. چونکە بەختەوەری لە نەبووندایە تا بێجگە لە پەرورندە و دەستوورەکانی هیچیتری بۆ نەمێنی.

**پەندەکانی حەج**- ئەم سەفەرەیان وەکوو سەفەری دوارۆژ راڤە کردووە؛ لەم سەفەرەدا مەنزڵگا خانووی خوایە و مەبەست خودانی خانووە. کەواتە دەبێ لە دەسپێک و چەندو چوونی ئەم سەفەرە، چۆنییەتی سەفەری دوارۆژ فێر بێ. کاتێ ماڵاوایی لە دۆست و خزم و بنەماڵەی دەکا، بزانێ ئەمە وەکوو ماڵاوایی و گەردنئازایی سەرەمەرگە. هەروەها دەبێ دڵ لە هەموو گراوەکانی دونیا رزگار کا و پاشان ڕێی سەفەر ببرێ، هەر وەکوو چۆن لە کۆتایی تەمەنیدا دڵ لە دونیا دەکەنێ و خۆی دەرباز دەکا؛ ئەگینا سەفەری بۆ دەبێتە ژاری مار.

چۆن بۆ توێشووی ڕێگا ئەوەی پێویست بێ و بۆی بڕوا، دەگەڵ خۆی دەیبا، نەکوا لە بیاواندا بێبەرگ و خۆراک بمێنێتەوە، دەبێ بزانێ سارای ڕۆژی پەسڵان درێژتر و بە سامترە و لەوێ زۆرتر پێویستی بە توێشووە. بۆ سەفەر کە دەڕوا ئەو شتانەی مەترسی فەوتانیان هەبێ، دەگەڵ خۆ نایبا، چونکە دەزانێ دەفەوتێن و شیاوی سەفەری سارا نین، هەر بەم چەشنە هەر عیبادەتێ کە مەرایی و

دوورویی و کورتی تێدا تێکەڵاو بێ، شیاوی زادی دوارۆژ نییە.

کە سواری حوشتر بوو، دارەتەرمی بێتەوە یاد و دڵنیا بێ کە وڵاخی لە سەر ڕێگای دوارۆژدایە و ئەوەی لە بیردا بێ کە بۆی هەیە بەر لەوەی لە وڵاخەکەی دابەزێ، کاتی سوار بوون لەسەر دارەتەرم گەیشتبێ: دەبێ ئەم سەفەرەی بە چەشنێ بێ کە شیاوی تۆیشووی دوارۆژ بێ.

کە بەرگی ئیحرامی تەیار کرد و کاتێ گەیشتە مەنزڵگا، بەرگی خۆی داکەند و ئەوەی دەبەر کرد، ئەم بەرگەش دوو فۆتەی سپییە، دەبێ یادی تەرمەپۆش[1] کا. چونکە بەرگی ئەو دونیاش ئاوەژووی بەرگی ئەم دونیایەیە. کە ڕێی هەڵەت و پڕ لە مەترسی چۆڵگەکانی دی، یادی «نەکیر و مونکیر» و دوو پشک و مار و نووری قەبر کا؛ چونکە لە قەبرەوە تا ڕۆژی حەشر، ڕێگایەکی ئێجگار درێژی پڕ ئاستەنگ و کۆسپ و هەڵەتە. هەر وەکوو چۆن بێ ڕێبەر و ڕێشاندەر لە بەڵاکانی ڕێگا ناپەڕێتەوە، بەبێ ڕێنومایی عیبادەتەکان، لە مەترسی و پێشهاتەکانی گۆڕ دەرباز نابێ. هەروەها لە قەبریشدا وەکوو سارا بە دوور لە ماڵ و منداڵ و دەست و پێوەندە.

کە لەببەیک دەڵێ: دەبێ بزانێ ئەمە بەرسڤی بانگی خوایە، ڕۆژی پەسڵانیش ئەم بانگەی دەگاتە گوێ: لە گەورەیی ئەم بانگەدا ڕادەمێنن و بیری لێ دەکەنەوە. عەلی کوڕی حسەین لە کاتی بەستنی ئیحرامدا زەرد هەڵگەڕا و هاتە لەرزە و لەببەیکی پێ نەبێژرا. گوتیان : «کوو لەببەیک ناڵێی؟» گوتی: «زۆر دەترسم ئەگەر بڵێم، بڵێ "لا لَبّیکَ وَ لا سَعْدَیْکَ"». کە ئەوەی گوت لە حوشتر داکەوت و بوورایەوە.

ئەحمەدی کوڕی ئەبیلحەواری، موریدی ئەبووسلەیمانی دارانی بوو. دەڵێ: لە پەرای ئەبوو سلەیمانی دارانیدا بووم، لەببەیکی نەگوت، نەختێ ڕاما و بوورایەوە. کە هۆشی هاتەوە بەر، گوتی: «ئەحمەد! پەروەردگار بە مووسای گوت: بڵێ بە زۆربێژانی ئوممەتت ناوم نەبەن و بیرم نەکەن، چونکە هەرکەس یادم کا، منیش یادی لێ دەکەم، بەڵام ئەگەر زۆربێژ بن، بە لەحنەت یادیان دەکەم». هەروەها گوتی: «ئەوەی لە پارەی حەجەکەی دڕدۆنگ بێ، کاتێ دەڵێ لەببەیک، لەوەرامیدا دەڵێن لا لبیک و لا سَعْدَیْکَ حتّی تَرُدَّ ما فی یَدَیْکَ».

تەواف و سەعی وەکی ئەوەیە هەزاران و بی پەنایان بڕۆنە کۆشک و بارەگای خونکارێک و بە دەوریدا بسووڕنەوە تا بەڵکوو دەرفەتێ بێنن و نیازی خۆیانی پێ بڵێن. لە نێو کۆشکەکەدا دێن و دەڕۆن و چاوەچاوی کەسێکیانە کە ببێتە تکاکاریان و پاپای ئەوەیان هەیە کە بەڵکوو ناکاو خونکار چاوی پێیان کەوێ و بە سیلە چاوێ سەیریان کا، نێوانی سەفا و مەروە وەکوو ئەو گۆڕەپانەیە.

بەڵام ئەوەی کە خەڵکی جۆراوجۆر لە چوار تەنشتی دونیاوە لە عەرەفات ئاپۆرە دەبەستن و بە

---

[1] - تەرمەپۆش- کفن.

هەموو زمانێک خەریکی سکاڵا دەبن، وەکوو سارای مەحشەرە .کە هەموو مرۆڤان کۆوە دەبن و هەرکەس لە بیری خۆیایەو لە کاری خۆیدا راماوەو دڕدۆنگ و بەگومانە لەوەی کە چلۆن وەردەگیرێ.

بەڵام هاویشتنی بەرد: مەبەست پیشان دانی بەندەگییە. بو نواندنی بەندەگی و پەرستنی پەروەردگار و چاوبڕین لە ئیبراهیمی خەلیل، کە لەو شوێنەدا شەیتانی هاتە کن و دەیویست دڵی بە گومان کا و ئەویش بەردی بۆ هاویشت. ئەگەر بە بیرتدا تێپەڕا کە: «شەیتان بۆ ئیبراهیم خویان بوو، بەڵام بۆ من نەبووە، بۆچی بێ کەلک بەرد بهاوێژم؟» ئەوە بزانێ کە ئەم بیرە شەیتان بۆتی پێک هێناوە. کوچکی بۆ بخە تاکوو پشتی تێکبشکێ. پشتی شەیتان بەوە دەشکێ کە تۆ بەندەیەکی گوێڕایەڵ بی و لە پەیڤی خودا لانەدەی و چاودێری دڵ و کردەوەی خۆت کەی. دڵنیا بە و بزانە بەم بەردهاویشتنە شەیتانت تێک شکاندووە.

ئەم رادەکە هاتە گوتن دەسپێکە بۆ ئەو کەسانەی بە تەمان رێگای خودا بگرنە بەر و لە کاکڵە و ناوەڕۆکی بابەتەکان تێبگەن و ئەوەش بزانن راستەقینەی بەندەگی و پەرستنی خوا سەرتر لەم رواڵەتەیە و ژیانی عیبادەت هەر ئەمەیە.

## بنه مای هه شتم – قورئان خوێندن

باش بزانه كه قورئان خوێندن هێژاترین عیبادەتە؛ بە تایبەت لە كاتی راوەستان لە نوێژدا. پێغەمبەر فەرمووی: «هێژاترین عیبادەت لە لای من قورئان خوێندنە». دیسان فەرمووی: «گەر نیعمەتی قورئانخوێندن درایە كەسێك، كەچی پێی وابوو هێژاتر و بەرزتر لەوە دراوەتە كەسێكیتر، ئەوەی خودا بە گەورە و هێژای زانیوە، ئەو بە سووكی سەیری كردووە». دیسان گوتی: «ئەگەر قورئان لە بەرگێكدا بێ و ئەو بەرگە بخرێتە نێو ئاور، قەد ناسووتێ». فەرمووی: «رۆژی پەسڵان هیچ تكاكارێك گەورەتر لە قورئان لە لای پەروەردگار نییە؛ نە پێغەمبەر، نە فریشتە و نە كەسیتر». دیسان گوتی: «هەركەس بە بۆنەی قورئان خوێندنەوە دوعای پێ نەخوێندرێ، هێژاترین و بەرزترین پاداشی شوكرانەبژێرانی پێدەدرێ». پێغەمبەر فەرمووی: «دڵ وەكوو ئاسن ژەنگ دایدەگرێ». گوتیان : «یا رەسووڵەڵلا! بەچی پاقژ دەبێتەوە؟» فەرمووی: «بە خوێندنی قورئان و یادی مردن كردنەوە». گوتی: «من رۆیشتم و مۆچیاریبێژێكم بۆتان بەجێهێشت، یەكێك بەدەنگ و یەكێك بێدەنگ: بەدەنگ قورئانە و بێدەنگ یادی مەرگ».

ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «قورئان بخوێنن، چونكە پاداشی هەر پیتێكی دەچاكەیە؛ ناڵێم كە "الم" پیتێكە، بەڵكوو ئەلف پیتێكە، لام پیتێكە و میم پیتێك». ئەحمەدی حەنبەل دەڵێ: پەروەردگارم بە خەو بینی، پرسیم خوایا! چۆن دەتوانم لێت نزیك بم؟ فەرمووی: بە پەیڤی من، قورئان؛ گوتم: «دەبێ لە واتاكەی بگەین؟» فەرمووی: «چ لە واتای بگەن چ نەگەن».

### قورئان خوێندنی لارێیان

باش بزانە ئەوەی قورئان فێر بوو، پلە و پایەی گەلێك بەرز بوو: دەبێ رێز و حورمەتی قورئان رابگرێ و خۆی لە كاری نابەجێ ببوێرێ و لە هەموو بارودۆخێكدا بەرێز و حورمەت بێ؛ گەر وانەبێ،

ڕەنگە قورئانی ببێتە دوژمن.

پێغەمبەر فەرمووی: «زۆربەی دوڕازانی[1] ئوممەتی من لە قورئان خوێنانن».

ئەبوو سلەیمانی دارانی گوتی: «گزیرانی دۆژەخێراتر بەردەبنە گیانی قورئان خوێنانی خراپکار تا کافران». لە تەوراتدا هاتووە کە خودا دەڵێ: «ئەی بەندەی من! گەر نامەی برادەرێکت پێ بگا و لە نێو ڕێدا بی، ڕادەوەستی، یا دادەنیشی و بە وردی نامەکەی دەخوێنیتەوە و لە واتای وشە بە وشەی ڕادەمێنی؟ دەسا ئەم کتێبەی من، نامەیەکە و بۆتم ناردووە تا تێیدا ڕامێنی و گوێی بۆ ڕادێری؛ کەچی تۆ خۆتی لێ دەبوێری و گوێی لێناگری، یا خۆ ئەگەر بیخوێنیەوە، لە مەبەست و ناوەرۆکی ورد نابیەوە».

حەسەنیبەسری گوتی: «پێشوونان، قورئانیان بە نامەیەک دەزانی کە لەلای پەروەرندەیانەوە بۆیان هاتووە؛ شەو بەرامانەوە دەیانخوێندەوەو ڕۆژ بە پێی ئەو دەبزووتنەوە. ئێوە وەکوو وانە دەیخوێنن. پیت و سەرو ژێرەکانی بە جوانی دەخوێننەوە، کەچی دەستوورەکانی بە ئاسان دەگرن».

بە گشتی دەبێ بزانن کە مەبەست لە قورئان، تەنیا خوێندنەوەی پیت و وشەو دەنگەکانی نییە، بەڵکوو مەبەست بە کارهێنانی دەستوورەکانیە. خوێندن بۆ لەبەرکردنە و لەبەرکردن بۆ بەکارهێنان؛ ئەوەی قورئان بە باشی دەخوێنێ و پیت و سەرەو ژێرەکانی بە تەکووزی دەڵێتەوە، کەچی بە پێی ئەو نابزوێتەوە، وەکوو ئەو نۆکەرەیە نامەیەکی لە ئاغاکەیەوە پێ گەیشتووە و لە نامەدا ئامۆژگاری بۆ نووسیوە. کابرا نامەی ئاغا بە دەنگی خۆش و خەمین دەخوێنێتەوە، کەچی هیچ ئاوڕ لە کاکڵە و ناوەرۆکی ناداتەوە و بە پێی ئامۆژگارییەکانی ناجووڵێتەوە. بێگومان ئاوەها کەسێک شیاوی سزا و تێهەڵدانە.

## ئەدەبەکانی قورئان خوێندن

**ئەدەبە ڕواڵەتییەکان** – لە ڕواڵەتدا دەبێ ئاگاداری ئەم شەش دەستوورە بێ:

**یەکەم** – ئەوەیە کە بەڕێز و حورمەتەوە بیخوێنێ، پێشتر تارەتی گرتبێ و ڕوو لە قیبلە و ملکەچانە دانیشتبێ، وەکوو نوێژ. عەلی کوڕی ئەبووتالیب دەڵێ: «هەرکەس لە کاتی ڕاوەستانی نوێژدا قورئان بخوێنێ، بۆ هەر پیتێک سەد پاداش و چاکەی دەدرێتێ. ئەگەر لە کاتی ڕۆنشتنی نوێژدا بیخوێنێ، پەنجا چاکەی بۆ دەنووسرێ؛ ئەگەر لە نوێژدا نەبێ، بەڵام تارەتی بێ، بیست و پێنج چاکەی بۆ دەنووسرێ؛ ئەگەر بەبێتارەت بیخوێنێ، پتر لە دە چاکەی بۆ نانووسرێ. ئەوەی لە کاتی

---

[1] – دوڕاز: ناڕاست، دووڕوو.

شەو دەیخوێنێ -بە تایبەت لە نوێژدا- هێژاترە؛ چونکە دڵ ئازادترە و خێرەکەشی زۆرترە».

**دووەم** – ئەوەیە کە بە هێوری و بە کاوەخۆ بیخوێنێ و تێیدا رامێنێ و بۆ دوایی هێنانی لەزوبەز نەکا، وەکوو ئەو کەسانەی بە پەلە قورئان دەخوێنن تا هەر رۆژ دەورێکی قورئان بخوێنن. پێغەمبەر فەرمووی: هەرکەس کەمتر لە سێ رۆژ خەتمێکی قورئان بخوێنێ، چاکەی قورئان خوێندنی پێ‌ناگا». ئیبنی عەبباس دەڵێ: «إذا زُلزِلَتْ و اَلقارعه» بە هێوری دەخوێنم و بیری لێ دەکەمەوە، زۆرتر پێم خۆشە تا ئەوەی کە اَلبَقَرَ و آل عمران بە پەلەپەل بخوێنمەوە. عایشە کەسێکی بینی بەپەلە قورئان دەخوێنێ؛ گوتی: «نە بێ‌دەنگە و نە قورئانخوێن».
ئەوەش کە عارەب نەبێ و بە خوێندنی قورئان لە واتای نەگا، دەبێ هەر بە هێوری قورئان بخوێنێ، تا رێزی قورئانی راگرتبێ.

**سێهەم** – گریانە؛ پێغەمبەر فەرمووی: «قورئان بخوێنن و بگرین؛ ئەگەر بە راست نەتاندەتوانی بگرین، دەنگتان وەکوو دەنگی گریان لێ بکەن». ئیبنی عەباس دەڵێ: «کە ویردی سوجدەتان خوێند، لە هەستانەوەو کڕنۆش بردندا پەلە مەکەن تا بگرین؛ ئەگەر کەسێک بە چاو ئەسرینی دانەڕشت، دەبێ بە دڵ بگری». پێغەمبەر فەرمووی: «قورئان بۆ خەم و پەژارە هاتۆتە خوار، کە دەیخوێنن خۆتان خەمین کەن». هەرکەس لە مزگێنی و هەڕەشەکانی قورئان رامێنێ و بێ‌هێزی خۆی ببینێ، ئەگەر نەکەوتبێە داوی هەوەس، خەم و کەسەر دایدەگرێ.

**چوارەم** – ئەوەیە کە هەر کردەوەیەک کە شیاوی هەر ئایەتێکە بە جێی بێنێ. پێغەمبەر کە بە ئایەتی سزا رادەگەیشت، پەنای دەبردە بەر پەروەردگار، کە بە ئایەتی خێرو ودم دەگەیشت، شوکر و سپاسی دەگوت؛ لە سەرەتادا : «أعوذ»ی دەگوت و کە دەگەیشتە کۆتایی دەیگوت : «اَللَّهُمَّ ارْحَمْنی بِالقُرآنِ وَ جْعَلْهُ اَماماً و نوُراً وَ هُدیً وَ رَحْمَةً. اَللَّهُمَّ ذَکِّرْنی مِنْهُ ما نَسیتُ وَ عَلِّمْنی مِنْهُ مَا جَهِلْتُ وَرْزقَنی تلاوَةَ آناءَ اَلَّیْلِ وَ النَّهارِ وَ جْعَلْهُ لِی یاربَّ العالَمین[1]».
کە بە ئایەتەکانی کڕنۆش گەیشت، کڕنۆش ببا، سەرەتا تەکبیر بڵێ و پاشان بڕواتە کڕنۆش. ئەوانەی کە مەرجی بەجێهێنانی نوێژ بوون (وەکوو داپۆشانی شەرمگا و تارەت) بۆ قورئان خوێندن بە

[1] - خوایا بمبەخشە بەم قورئانە و ئەم قورئانەت بکە بە پێشەواو رێبەر و رووناکیدەر و خێرو ودمی رێم؛ خوایا! ئەوەی لە قورئانم لە بیر نەماوە، بیخەرە یادم، ئەوەی نایزانم پێم فێرکە و خوێندنی قورئان لە سەروبەری شەودا بکەرە بەشم و بیکەرە بەڵگەیەک بۆم، ئەی راهێنەری هەموو جیهان.

جێی بێنێ و تەکبیر و کڕنۆش بەبێ ئەتەحییات و سڵاو، بەستە بۆ سوجدە بردن.

**پێنجەم** - ئەگەر قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز ببێتە هۆی دوڕازی یاخۆ تێکدانی نوێژی کەسێکی‌تر، بە هێوری بیخوێنێ؛ لە خەبەردا هاتووە کە «هێژایی قورئان‌خوێندن بە دەنگی نزم بەسەر دەنگی بەرزدا وەکوو سەدەقە و چاکەی نهێنیە بەسەر ئاشکرادا». ئەگەر لەوانەی بێژران بەدوور بوو، چاتر ئەوەیە دەنگ هەڵبڕێ تا کەسانی‌تریش چێژی لێ ببەن، زۆرتری شارەزا بن و ورەیان بەرز کا و خوستیان زۆرکا و خەویان بڕەوێنێ و نووستوانی‌تر بە خەبەر کاتەوە. ئەگەر هەمووی ئەم مەبەستانە کۆوە بن. بۆ هەر یەکەیان چاکەیەکی پێ دەگا. ئەگەر لە رووی کتێب بیخوێنێ، بەدەوترە؛ چونکە چاویش لە کاردایە. دەڵێن: «خەتمێک لە رووی کتێب، وەکی حەوت خەتمی بێ کتێبە». یەکێک لە مەلایەنی میسر گەیشتە خزمەتی شافعی، بینی کە قورئانی کردۆتەوەو لە کڕنۆشایە. شافعی گوتی: فیقەئەنگوێ لە قورئان دوور کردۆتەوە. من پاش نوێژی خەوتنان، قورئان هەڵدەگرم و تابەیانی داینانم».

پێغەمبەر، شەوێک ئەبووبەکری بینی خەریکی نوێژە و بە هێمنی قورئان دەخوێنێ. فەرمووی: «بۆچی هێور دەیخوێنی؟» گوتی: «ئەو کەسەی کە بۆی دەیخوێنم، دەیبیسێ». عومەری بینی کە بە دەنگی بەرز دەیخوێنێ. فەرمووی: «دەنگت بۆچی هەڵبڕیوە؟» گوتی: «خەوتووان بە خەبەر و شەیتان دوور دەکەمەوە». فەرمووی: «هەردووتان چاکتان کردووە». ئەم کردەوانە بە گوێرەی مەبەست لە پێوانە دەدرێن؛ کە مەبەستی هەر دوو باش بوو، هەر دوویان پاداشیان هەیە.

**شەشەم** – تێبکۆشی تا بە دەنگی خۆش بیخوێنی؛ پێغەمبەر فەرمووی: «قورئان بە دەنگی خۆش و جوان برازێننەوە». پێغەمبەر خودانی[1] «بووحوزەیفە»ی دی قورئان بە دەنگی خۆش دەخوێنێ، فەرمووی: «اَلحَمْدُلِلّه اَلَّذی جَعَلَ فی اُمَّتی مِثلَه[2]»؛ هۆکەشی ئەوەیە کە هەرچەن دەنگ خۆشتر بێ؛ کاریگەری بەسەر دڵدا زۆرترە.

**ئەریتە دەروونییەکان** - ئەوەش شەشە:

**یەکەم** - دەبێ گەورەیی ئەم پەیڤە بزانێ، کە هی خوایە و کەونەو دانستەی وییە؛ راستاو بە خوایەو

---

[1] - بەو جۆرەی لە ئەحیادا هاتووە، ناوی ئەم خودانە «سالم» بووە.

[2] - سوپاس بۆ خودایەک کە وەکوو ئەوی لە ئوممەتی من دا دانا.

ئەوەی بەسەر زاری ئەودا دێ، تەنیا پیتە. هەر وەکوو ئەوەی کە گوتنی «ئاور» سانایە و هەرکەس پێ دەبێژرێ، کەچی کەس خۆی لە هەمبەر گەرما و تینیەوە پێناگیرێ؛ هەروەها راستەقینەی واتای ئەم پیتانە، ئەگەر خویان بن، حەوت ئاسمان و زەوین خۆیان لە هەمبەری ناگرن.

بەم بۆنەوە بوو کە پەروەردگار فەرمووی: «لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ[1]». بەڵام شان‌وشکۆ و گەورەیی قورئانیان بە بەرگی پیت و وشە شاردۆتەوە تا دڵ و زمانەکان توانی تێگەیشتنیان هەبێ؛ هەروەها ئەگەر لە بەرگی پیتدا نەبێ قەد نەدەگەیشتە دەستی مرۆڤ؛ ئەمەش هۆی ئەوە نییە کە لەو پەڕی پەیڤ و پیتدا شتەکی‌تر نییە. هەر وەکوو چۆن چوار پێ و وڵاخ لە ئاخاوتن و پەیڤی مرۆڤ هیچ تێناگەن و خوستی فامی ئەوەیان نییە و بەم بۆنەوە هەندێ دەنگیان بۆ راناون تا بەوە لە دەستوورەکانی مرۆڤ تێبگەن؛ ئەوانەش کە ئەم دەنگانە دەبیسن، بە گوێرەی ئەوانە دەبزوونەوە بە بێ ئەوەی لە راستەقینەی ئەو دەنگانە گەیشتبێتن؛ وەکوو گایەک کە بە پێی تێخوڕینێک زەوی شێف دەبڕێ و نازانێ مەبەست لەم شێو بڕینە نەرم کردنەوەی خاکە و مەبەست لە نەرم کردنەوەی خاک، ئەوەیە تا هەوای تێدا رۆچێ و ئاوی دەگەڵ تێکەڵ بێ و لەم سێیانەدا هەڵمی زەوی پێک بێ و تووی چاندراو رابێنێ و بیپەروەرێنێ. زۆربەی خەڵکی هەر ئەوەندە لە قورئان فام دەکەن کە ئەو چوارپێیانە لەو دەنگەی لێیان دەخوڕێ. بۆیە تاقمێ پێیان وایە قورئان پیت و پەیڤە و ئەمەش ئەو پەڕی سستی و لاوازی دڵ و فامە. ئەمە وەکوو ئەوەیە کەسێک پێی وابێ راستەقینەی ئاور، هەمان پیتی «ئا» و «و» و «ر»ێیە و نازانن کە ئەگەر لاپەڕەی کاغەز ئاور ببینێ، بێجگە لە خۆڵەمێش چیدی لێ نامێنێ. کەچی ئەم پیتانە هەموو دەم لەسەر ئەم لاپەڕەن و هیچ کاریشی پێ ناکەن. هەروەکوو چۆن هەر جەستەیەک گیانێکی هەیە کە رۆژێک بەجێی دێڵێ، واتای پیتەکان وەکوو گیانن و پیتەکان خۆیان جەستەن. جەستەی پیتەکان بە هۆی گیانی واتاکەیانەوە هێژایە. راڤەی ئەم راستەقینەیە لە ئاوەها کتێبێکدا ناگونجێ.

**دووەم** — ئەوەیە کە گەورەیی پەروەرندەی -کە ئەمە پەیڤی وییە- لە دڵ تەیار کاو پاشان بیخوێنێ و ئاگادار بێ کە پەیڤی کێ دەخوێنێتەوە و لە نێو زەریای بێ‌بنێ کێ رۆدەچێ، کە پێی دەڵێ: «لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ[2]».

هەر وەکوو چۆن کەس ناتوانێ دەست بە قورئاندا بکێشێ مەگین بە دەستی خاوێن، راستەقینەی

---

[1] - قورئان (٢١/٥٩) ئەگەر ئێمە ئەم قورئانەمان ناردبایەتە سەر کەژێک، تۆ دەتدی کە داهاتووە و لە ترسی خوا لەت‌لەت بوو. (هـ)

[2] - قورئان (٥٦ / ٧٩) بێجگە پاکان کەس دەستی پێ راناگا.

پەیڤی خوداش تەنیا بە دڵێکی پاک و پاراو لە ئاکاری نزم و بە دوور لە هەر پیساییەک و رازاوە بە رووناکی بڕوا و شەرم و خاکەساری دێتە دیتن. بەم بۆنەوە بوو کە «عەکرەمە» هەر کات قورئانی دەکردەوە، دەبووراوە و دەیگوت: ئەوە پەیڤی پەروەرندەمە، ئەوە پەیڤی پەروەرندمە.

کەس لە گەورەیی قورئان ناگا، مەگین ئەوەی لە گەورەیی خودا بگا. دڵ لەم گەورەییە بێبەشە تا ئەوەی لە دانستەکانی رامێنێ و پێیانبگا. کاتێ عەرش و کورسی و حەوت ئاسمان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە لە فریشتەو جنۆکە و مرۆڤ و چوارپێ و مەل و مۆر و دار و دەوەن و گژ و گیا و نووک‌وبەدی بوونەوەرانی لەدڵدا تەیار کرد و زانی کە ئەمە وتەی ئەوەو سەرلەبەری ئەم جیهانە خوارو بانە لە ژێر رکێفی ئەوایە و ئەگەر هەمووان تەفروتوونا کا، لە کەس سڵ ناکا و لە کامڵبوونی ئەودا هیچ کەموکووڕییەک نییەو ئافرێنەر و راهێنەر و بەخێوکەری هەمووانە؛ ئەوسا رەنگە تۆزکاڵێ لە گەورەیی پەروەردگاری بە دڵ بۆ بناسرێ.

**سێیەم** – لە کاتی قورئان خوێندندا دڵی گوێڕایەڵی پەیڤی خودابێ و هەڵوەدای دووی خەیالاتی خاو نەبێ؛ ئەو بەشانەی دڵی پێ نەسپاردبێ و تێی‌نەگەیشتبێ، بە نەخوێندراوی دابنێ و جارێکی‌تر بیخوێنێتەوە. ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە بۆ سەیران بڕواتە نێو گوڵزارێ، کەچی ئاگای لێ نەبێ و بە جوانی سەیری ئەو گوڵ و گوڵزارە نەکا و بێبەش لەو خۆشییە بگەڕێتەوە، دەبێ جارێکی‌تر بڕواتەوەو بە تەکووزی سەیری‌کا. قورئان سەیرانگای بڕوادارانە؛ سەیر و سەمەرە و ئامۆژگاری وای تێدایە، کە هەرکەس لێیان ورد بێتەوە، ناپەرژێتە سەر هیچ کاریتر. ئەگەر کەسێک لە واتای قورئان نەزانێ، کەمتر بەش دەبا؛ بەڵام دەبێ بیر لە گەورەیی خودا کاتەوەو بیری پرژ و بڵاو نەبێ.

**چوارەم** – لە واتای هەر رستەیدا رامێنێ تا تێی بگا؛ ئەگەر بەجارێک تێنەگەیشت، جارێکی‌تر بیخوێنێتەوە، ئەگەر لە بەشێ لە قورئان چێژی زۆری برد، باشتر ئەوەیە ئەو بەشە چەن جار بخوێنێتەوە، تا ئەوەی کە بەشەکانی‌تری قورئان بخوێنێ.

ئەبووزوری غەفاری دەڵێ: «پێغەمبەر، سێ‌یەکێ شەو تا بەیانی ئەم ئایەتەی دووپاتە دەکردەوە: إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ[1]؛ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ی بیست جار دەخوێندەوە.

[1] - قورئان (١١٨/٥) گەر بتەوێ ئازاریان دەی، عەبدی خۆتن؛ گەر بشتەوێ لێیان خۆش بی، خۆت دەزانی و هەر بۆ خۆتی کە دەســتەڵاتت بە دەستەوە و لەکار زانی. (هـ)

سەعیدی کوڕی جوبەیر شەوێ تا بەیانی ئەم ئایەتی خوێندەوە: «وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ[1]».

کەسێک ئایەتێ بخوێنێ و لە بیری ئایەتێکی‌تر دا بێ، ئەرکی ئەو ئایەتەی بەجێ نەهێناوە. عامر کوڕی عەبدی‌قەیس گلە و گازەی لە وازواز هەبوو؛ گوتیان: «ئەوە چیرۆکی ئەم دونیایەیە». گوتی: ئەگەر نەشتەر دەسینگمدا رۆکن، لە لام ساناتر لەوەیە لە نوێژدا بیر لە دونیا کەم». بەلام بیر لەوەی کە بەیانی لە رۆژی پەسلاندا چۆن لە بەرانبەر پەروەرندەی راوەستێ، بە وازوازی دەزانی؛ چونکە بروای وابوو کە هەر وشەیەک کە لە نوێژدا دەیلێ، دەبێ بیری لەسەر بێ و نەپەرژێتە سەر باسی‌تر؛ کە بیرێکی‌تری بە مێشکدا تێپەڕا -هەرچەن بیری دین بێ- وازوازییە. لە هەر ئایەتێکدا دەبێ تەنیا لە بیری هەمان ئایەتدا رامێنێ: کە ئایەتی دانستەکانی پەروەردگاری خوێند، دەبێ بیر لە نهێنی دانستەکانی کاتەوە کە بریتین لە پاکی و هێژایی و بەدەستەلاتی و بەشکۆیی و هتد؛ کە ئایەتی کردەوەکانی دەخوێنێ -«خَلَقَ السَّموات وَ الأرْض»- لە سەیر و سەمەرەکانی جیهان، گەورەیی و بە دەسەلاتی ئافرێنەری بناسێ و لە بەرزی و تەواوی زانست و خوستی رامێنێ، تا وای لێ بێ هەرچی ببینێ، شێوەی ئەوی تێدا بێ. هەموو شت بەو بزانێ و بە هۆی ئەوەوە بیزانێ. کە ئەم ئایەتی خوێندەوە کە دەڵێ: إِنَّا خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ[2]، لە سەیر و سەمەرەی تنۆکە ئاوێکدا رامێنێ کە چۆن دڵۆپێ ئاوێکی یەک جۆر، ئەم هەموو شتە جۆراوجۆرەی (وەکوو گۆشت و پێست و ئێسقان و دەمار) لێ دێتە دی و پاشان لەوانە ئەندامی وەکوو دەست و پێ و سەر و چاو و زمان و هتدی ئافراندووە و پاشان بەو ئەندامانە گەوهەری واتای سەیرو سەمەری وەکوو دیتن و بیستن و زمانی پێ داون.

لێکدانەوەی سەر لەبەری واتاکانی قورئان گەلێک دژوارە و ئەمەی بێژرا بۆ ئەوە بوو خوێنەر زۆری تێدا رامێنێ.

واتای قورئان بۆ سێ کەسان خویان نابێ: **یەکەم** ئەوەی کە سەرەتا پاچڤەی[3] قورئانی نەخوێندبێ و لە عارەبی هیچ نەزانێ؛ **دووەم** ئەم لەسەر گوناحێکی گەورە پێیدا گرتبێ، یاخۆ لە دین لای دابێ و دڵی رەش هەلگەڕابێ؛ **سێیەم** ئەو کەسەی لە زانستی کەلامدا بروایەکی دەسکەوتبێ و لەسەر روالەتی قورئاندا سوور وەستابێ و هەرچی بە ئاوەژووی ئەوە بە دلیدا هات، تووکو نزای لێ بکا و خۆی لێ ببوێرێ، ئەم کەسە قەد لە روالەت بەو لاوە ناچێ.

---

[1] - قورئان (٥٩/٣٦) ئەی ئەوانەی تاوانبارن! ئێوەش ئەمرۆ نەشێ خۆتان جیا کەنەوە. (هـ)

[2] - قورئان (٢/٧٦) ئێمە مرۆن لە تنۆکێکی ئاوێتە وەدی هێنا تا بیئەزمووین: (هـ)

[3]. پاچڤە: تەرجمە.

**پێنجەم** – ئەوەیە کە دڵی بە گوێرەی واتای ئایەتەکان ئاڵوویری بەسەردابێ: کە گەیشتە ئەو ئایەتانەی لەمەڕ ترسن، ترس و نگەرانی هەموو گیانی دابگرێ، کە گەیشتە ئایەتگەلی رەحمەت، شاد و شوکور بێتەوە و کە پەسنی پەروەردگاری بیست خۆی خوار و خاکەسار بگرێ و کە قسەی پروپووچی لارێیانی بیست کە لە مەڕ پەروەردگاریان گوتووە (وەکوو ئەوەی خوا خێوی رۆڵە و ئامبازە) دەنگی نزم کا و بە شەرم و حەیاوە بیخوێنێ. هەروەها هەر ئایەتێک واتایەکی هەیە و هەر واتایەکیش هۆیەک. دەبێ لە هۆکانی بگا تا ئەرکی خۆی بەجێ هێنابێ.

**شەشەم** – وا گوێ بۆ قورئان راگرێ، وەکی ئەوەی گوێی بۆ خودا راگرتووە. گەورەیەک دەڵێ: «قورئانم دەخوێند و هیچ چێژم لێ نەدەبرد، تا وام بیر دەکردەوە کە لە پێغەمبەری دەبیسم؛ لەمە سەرتر رۆیشتم و بیرم دەکردەوە کە لە جوبرەئیلی دەبیسم، چێژی زۆرتری دامێ. لەوەش سەرتر رۆیشتم و ئیستا وا بیر دەکەمەوە کە لە پەروەرندەمی دەبیسم، چێژێکم دەداتێ کە قەد نەمبردووە».

## بنەمای نۆهەم – یادی پەروەردگار

بزانە کە مەبەست و کاکڵەی هەموو پەرستنێک، یادکردنی پەروەردگارە؛ چونکە ئەستوون و کۆڵەکەی موسوڵمانی نوێژە و مەبەست لە نوێژیش یادی خوایە. هەر وەک فەرمووی: «إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ[1]».

خوێندنی قورئان، هێژاترین عیبادەتە؛ چونکە قورئان، پەیڤ و قسەی خودایە. ناوەرۆکیشی هۆی نوێ کردنەوەی یادی خودایە. مەبەست لە ڕۆژوو، بەزاندنی سوپای شاوەتە؛ تا دڵ لە ژێر ڕکێفی شاوەت دەرباز و پاک و پاراو بێ و ببێتە مەکۆی یادی خوا؛ چونکە کە دڵ تەژی لە شاوەت بوو، یادی خوای پێ ناکرێ و هیچ کاری لێ ناکا. مەبەست لە حەج، زیارەتی خانووی خودایە و یادی خودانی خانووە و هاتنە سەر شەوقە بۆ گەیشتن بە پەروەرێنەر. کەواتە، کاکڵەی هەموو عیبادەتێ، یاد و زیکرە. بنەمای موسوڵمانی زاراوەی لا اِلهَ الاّ اَللّه یەو ئەمەش هەمان یاد و زیکرە و هەموو عیبادەتەکانیتر، بۆ سەلماندنی ئەم پەیڤەن. پەروەردگار لە سۆنگەی یادێکەوە کە تۆ دەیکەی، یادت دەکا؛ چ بەرهەمێک لەمە بەپیتتر؟ بۆیە گوتی: فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ[2]»؛ واتە یادم کەن تا یادتان کەم.

ئەم یادکردنە دەبێ بەردەوام بێ. ئەگەر بەردەوام نەبوو، دەبێ لانی کەم لە زۆربەی کاتەکاندا بێ؛ چونکە ڕزگاری و بەختەوەری بەوەو نووساوە. بۆیە گوتی: وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ[3]»؛ دەڵێ: ئەگەر ڕزگاریتان دەوێ، کلیلی ئەوە فرە یادکردنی خودایە لە زۆربەی دۆخەکاندا، نەک کەمتر. بۆیە گوتی: «ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ[4]» پەسنی ئەو کەسانەی کرد کە بە ڕاسان و

---

[1] - . قورئان (٢٩/٤٥) نوێژ خوێندن (مرۆ) لە کاری ناشیرین و ناڕەوا دەپارێزێ، یادی خودا هێژاترە(هـ).

[2] - قورئان (٢/ ١٥٢).

[3] - قورئان (٦٢/١٠) گەلێک یادی خودا کەن، شایەد ڕزگاریتان بێ، (هـ).

[4] - قورئان (٣/ ١٩١) ئەوانەی چ بە وێستاوی، چ لەجێوە، چ بەدانیشتن، چ لە سەر تەنیشت ڕادەزێن، هەر یادی خودا دەکەن. (هـ)

رازان و لە هەموو دۆخێکە یادی خوایان لەسەر زار ناکەوێ. گوتی: وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ[1]».

گوتی: هەموو بەیانی و ئێواران بە ترس و لەرز و گریانەوە یادی بکە و لە ریزی لەبیرکراوان مەبە. لە پێغەمبەریان پرسی: «چ کارێ هێژاتر لە هەموو کارە؟» فەرمووی: «ئەوەی کە بمری و زارت بە یادی خودا تەڕ بێ». دیسان گوتی: «ناتانەوێ ئاگادارتان کەمەوە لە بەدەوترین و باشترین کردەوەتان، لە وەرگیراوترین کردەتان لە لای پەروەردگار، لە بەرزترین ئاست و پلە و لەو شتەی بە نرختر و هێژاترە سەدەقەی زێڕ و زیو و خەزا دەگەل دوژمنانی دین، هەرچەن خوێنی ئێوە برژێ یا خۆ هی ئەوان؟» گوتیان : «ئەوە چییە یا رەسوولی خوا؟» گوتی: «یادی خوا». یادی خودای بەرز و مەزن. پەروەردگار گوتی: «هەرکەس وا بپەرژێتە سەری یادی من کە لە بیری نەمێنێ تکایەکم لێ بکا، پاداشی وی لە لای من پتر لەو کەسانەیە کە تکام لێ دەکەن». دیسان فەرمووی: «ئەوەی یادی خودا دەکا، لە نێو ئاپۆرەی بێ خەبەراندا وەکوو زیندووێکە لە نێو مردوواندا، یاخۆ دارێکی شینە لە نێو دار و گژ و گیای وشکدا، یاخۆ خەزاکەرێک کە بە تەنیا خەبات دەکا، لە نێو هەلاتوواندا». مەعازی جەبەل دەڵێ: «ئەوانەی لە بەهەشت دان سوێیان بۆ هیچ نابێتەوە، مەگین بە کاتێ کە لە دونیا بووبێتن و یادی خوایان نەکردبێ».

### راستەقینەی یادی خوا

بزانە کە یادی خوا چوار قۆناغە:

**یەکەم** – ئەوەی کە بە زبان بێ و دڵ لێی بێ ئاگا بێ. ئەمەش کاریگەری هەیە، بەلام کەم. زمانێ کە پەرژابێتە سەر پەرای خوا،هێژاتر لەو زارەیە کە خەریکی کاری پڕ و پووچ بێ، یاخۆ خەریکی هیچ نەبێ.

**دووەم** – ئەوەیە کە بەدڵ بێ، بەلام سەقامگیر نەبێ و بە زۆر دڵی پەرژاندرابێتە سەری، دەسا گەر ئەو زۆر لێکردنە نەبێ، دەڕواتەوە سەر کاروباری خۆی و دەپەرژێتەوە سەر دونیا.

**سێیەم** – ئەوەیە کە یادی خوا لە دڵیدا سەقامی گرتبێ و دەبێ بە زۆر بخرێتە سەر کارێکیتر؛ ئەمەش گەلێک هێژا و بەنرخە.

---

[1] - قورئان (٧ /٢٠٥) هەموو بەیانی و ئێواران بە پاڕانەوە و ترسەوە. بە بێ ئەوەی دەنگ هەڵێنی – یادی پەروەرمندت بکە و هەرگیز تۆ لەوانە مەبە کە بە بیریشیاندا نایە. (هـ)

**چوارەم**- ئەوەیە کە یادکراو -واتە پەروەردگار- کونج و قوژبنی دڵی تەنیوەتەوە، نەک یاد؛ گەلێک جیاوازی هەیە لە نێوان ئەو کەسەی کە سەرلەبەری دڵی هۆگری یادکراوەو ئەو کەسەی کە هێمان دەبەندی یادە؛ بەڵکوو ئەوە کامڵبوونە کە یاد و ئاگاداری لە یادکردنەوە لە دڵ بڕواو تەنیا یادکراو بمێنێ و هیچ کەسیتر. چونکە یادکردنەوە چ عارەبی بێ یاخۆ کوردی، لە دزەی نەفس بێبەش نییە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە دەبێ دڵ لە هەرچی پەیڤی عارەبی و کوردی و زمانانیتره پاکژ بکرێ و هەمووی ببێتە پەروەرندە و یادکراو و بێجگە لە ئەو هەر هیچ نەبێ، هیچ هەر نەبێ. ئەمە ئاکامی خۆشەویستییە کە پێی دەڵێن «ئەڤین». ئەڤینداری ڕووگەش، هەموو گیانی بۆتە مەکۆی ئەڤینەکەی. ڕەنگە ئەوەندەش دڵی پێوە خەریک بێ، ناوی گراوەکەشی لە بیر کردبێ. کە بەم چەشنە خۆی و دەستو پێوەندی لە بیر کرد و بێجگە لە خوا، لە هەمووان نامۆ کەوت و خۆی لە زەریای خۆشەویستیدا بزرکرد، گەیشتۆتە سەرەتای ڕێگای تەسەوف. سۆفییەکان بەم دۆخە دەڵێن «توانەوە[1]» و نەمان؛ واتە هەموو شتێ تەنانەت خودی سۆفی لە یادی گراوەکەیدا بتوێتەوە و هیچ نەمێنێ و خۆی لە بیر کا. هەر وەکی چۆن پەروەردگار گەلێک جیهانیتری هەیە لە مەمانان بەرێیوارە و بە گوێرەی ئێمە هەر نییە، چونکە بوون لەلای ئێمە ئەوەیە کە دیارە و لێی ئاگادارین. ئەگەر ئەم شتانەی کە خویانن، لە بیری کەسێک ڕۆیشتەوە، بۆ وەی نەماوە و فەوتاوە؛ کە خۆشی لە بیر کردەوە، خۆی بەرێژەی خۆی فەوتاوەو نەماوە؛ کە دەگەڵی بێجگە لە خوا هیچ هەر نەما، هەموو بوون و کەسی ئەو دەبێتە خوا.

کە سەیری عاسمان وزەوی دەکەی و ئەوەی تێیدایە دەیبینی، بە خۆت دەڵێی: «جیهان هەر ئەمەیە کە هەیە، بێجگە لەمە هیچتر نییە»، ئەم سۆفییەش، بێجگە لە خوا هیچ نابینێ و بەخۆی دەڵێ : «گشت هەر ئەوەو بێجگە لە ئەو چیدی نییە»، لەم سۆنگەوە مەودای نێوان ئەو و خودا هەڵدەگیرێ و هەردوو دەبنە یەک و دوو نامێنێ. ئەمەش سەرەتای ڕێباز و ڕێگای یەکەتی و یەکبوونە. کە جیایی دەسرێتەوە، لە جیایی و دابڕان، دادەبڕێ و ئاگای لێی دەبڕێ. کەسێک ئاگای لە جیایی هەیە کە خۆی و خودا بەدوو بزانێ، کەچی ئەو کەسەی کە لە خۆی دابڕاوەو هیچ ئاگای لە خۆ نەماوەو بێجگە لە خوا کەس ناناسێ، کوو لە واتای جیایی دەگا؟

کە گەیشتە ئەم ئاستە، ناواخنی جیهانی سەرووی لێ خویان دەبێ، ڕووحی فریشتە و پێغەمبەران لە ڕواڵەتێکی خوشیک و جوان پێی شان دەدرێ، ئەوەی تایبەت بەخودای گەورەیە بۆی ئاشکرا دەبێ و بارودۆخی زۆر و زەوەندی بۆ دێتە دی کە لەوتن نایە.

کە بووژایەوەو هۆشی هاتە بەرو لە مەبەستی کارەکان گەیشت، ئاسەواری دەگەڵ دمێنێ و چێژی

---

[1] . توانەوە - فەنا.

ئەو دۆخەی لە دڵ بەردەوامەو دونیا و ئەوەی تێیدایە لە لای دزیو و ناحەز دەبێ؛ هەرچەن بە جەستە لە نێو خەڵکایە، بەدڵ لە هەموویان جیایەو سەری لێیان سڕ دەمێنێ کە بۆچی ناپەرژێنە سەر کاری دوارۆژو گەلێکیش بەزەیی پێیاندا دێ کە دەزانێ لە چ خێر و چاکەیەک بێ بەش ماون؛ خەڵکیش بە گێلی دەزانن و پێی پێدەکەنن و دڵیان پێی دەسووتێ کە بۆچی کاری دونیا ناکاو وای بۆ دەچن کە شێت و پەتیارەیەو ئاوەزی لێ گۆڕاوە.

ئەگەر کەسێک نەگەیشتە ئاستی توانەوەو نەمان و ئەمانەی بێژران، پێی پیشان نەدران، کەچی یادی (زیادی خوا) بەسەر دڵدا زاڵ بوو، ئەمە کیمیای بەختەوەرییە؛ چونکە کە یاد کردن لە دڵ سەقامگیر بوو، خۆشویستنی بە دوودا دێ، تا ئەوەی کە پەروەرندەی لە هەموو شتی ئەم دونیایە خۆشتر دەوێ؛ بەختەوەریش لەمەدایە. چونکە هەمووان دەگەڕێنەوە لای خودایان، چێژی مردنیان لە لا زۆروزەوەندەو بەقەدەر خۆشەویستییان، خۆشەویستەکەیان دەبینن. ئەوەی کەدڵی لە گرۆی ئەوینی دونیا نابێ، پاش مردن دەردی دووری و جیایی لەدونیای بە قەدەر خۆشەویستیەکەیە، بەو جۆرەی لە سەردێڕی موسوڵمانیدا هاتە گوتن. کەواتە، ئەوەی فرە یادی خودا کاو ئەو دۆخەی بێژرا بۆی نەیتە گۆڕێ، نابێ زویرو ناهۆمید بێ؛ چونکە بەختەوەری بەو دۆخەوە نەبەستراوە؛ کە دڵ بەیادی خودا رازایەوە، ئەو پەڕی بەختەوەری دێنێتە دی: ئەو کەسەی لەم جیهانەدا نهێنییەکانی بۆ خۆیان نەبن، لەو جیهانیتر بۆی ئاشکرا دەبن. دەبێ بەردەوام ئاگاداری دڵ بێ تا دەگاتە پەرای پەروەردگارو قەد ئاگای لە دڵی نەبڕێ؛ چونکە یادکردنەوەی بەردەوام کلیلی رێ بردنە نێو سەیرو سەمەرەکانی جیهانی سەرووە و بەم بۆنەوە بوو پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس بە تەمایە سەیری باخ و باخچەی بەهەشت بکات، دەبێ زۆر یادی خودا کا».

لەمەی بێژرا ئاشکرا بوو مەبەست و کاکڵەی سەرلەبەری عیبادەتان، یادی خودایە. یادکردنی راستەقینە ئەوەیە کە لە کاتی خراپە، بەربەستی مرۆڤ بێ و لە کارەساتدا دڵ بداتەوەو بۆ کاری چاکەش دنەدەر بێ.

ئەگەر وانەبوو و یادی خودا کردن نەیتوانی وابکا، لەراستی گەلێک بە دوورەو خەریکی باسی نەفس و شاوەت بووە.

### هێژایی تەلیلە و تەسبێحات و شوکرانە و سەڵەوات و تکای لێبوردن

**تەلیلە** - پێغەمبەر فەرمووی : «مرۆڤ هەر چاکەیەک کە لێی بێتەوە، لەرۆژی پەسڵاندا دەخرێتە نێو لەپی ترازوو، بێجگە لە «لا الە الاالله» کە ئەگەر لە کێشانە بدرێ، حەوت ئاسمانو زەوی و ئەوەی

تێدایە، دەیهێنێ». دیسان فەرمووی: «بێژەری "لاالەالاالله" ئەگەر راسبێژ بێ و بە قەدەر خاکی زەوی گوناحی بێ، لێی دەبوورن». هەروەها: «ئەوەی بە دڵپاکییەوە گوتی "لا الهَ الاالله" خرایە نێو بەهەشتەوە». دیسان فەرمووی: «ئەگەر کەسێک رۆژی سەد جار گوتی "لا الهَ الاالله وَحْدهُ لاشَریکَ لَه، لَهُ المُلْکُ ولَهُ الْحَمْدُ، یُحْیی وَ یُمیتُ وَهُوَ عَلَی کُلِّ شَیء قَدیر" وەکی ئەوەیە سەد کۆیلەی رزگار کردبێ و سەدچاکەی بۆ دەنووسرێ و سەد گوناحی لێ دەسڕێتەوەو تا شەو دەبێتە لەمپەرێک لە هەمبەر ئەم و شەیتان».

**شوکرانە و تەسبیح**: پێغەمبەر فەرمووی : «ئەوەی رۆژی سەدجار بڵێ "سُبحانَ الله وَبِحَمْدِهِ" هەموو گوناحەکان پێ دەبەخشرێ، هەرچەند بە قەدەر کەفی زەریا بێ». دیسان: «ئەوەی پاش هەر نوێژێ سی و سێ جار بڵێ سُبحانَ الله و سی و سێ جار بڵێ اَلْحَمْدُ لله و سی و سێ جار بڵێ اللهُ اکْبَر، پاشان بڵی "لاالەالاالله وحدە لاشریک لە، لە الملک ولە الحمد، یُحْیی وَ یُمیتُ وَهُوَ عَلَی کُلِّ شَیء قَدیر" و سەرجەم بینە سەدجار، لەهەموو گوناحەکانی خۆش دەبن، ئەگەر بە قەدەر کەفی زەریا بێ».

دەڵێن جارێ کابرایەک گەیشتە پەرای پێغەمبەر و گوتی: «دونیا ئاوڕم لێ ناداتەوە و هەژار و بەلەنگاز و بێدەرەتان کەوتووم، چارم چییە؟» فەرمووی: «بۆچی خۆت ناخەیتە بەر سەڵەواتی فریشتەکان و تەسبیحی خەڵکان؟ چونکە رۆزی بەوە دەدەن» گوتی: «ئەوە چییە، ئەی پێغەمبەری خوا؟» فەرمووی: هەموو رۆژێ بەر لە نوێژی بەیانی سەدجار بڵێ: «سُبْحانَ الله العَظیم، سُبحان الله وَ بِحَمده، استغفرالله» تا دونیا پێی خۆش بێ یا نە، ئاوڕی خێرت لێ بداتەوە و پەروەردگار لە هەر وشەیەک فریشتەیەک دەخولقێنێ کە تا رۆژی پەسڵان یادی خوا دەکا و تۆش لە خێری بەش دەبەی».

پێغەمبەر فەرمووی: «پاشەنازی چاکان ئەم وشانەیە: "سُبحانَ الله وَالحمدُ لله وَ لااله الا الله وَاللهُ اکبر"» پێغەمبەر فەرمووی: «وتنی ئەم وشانەم لەلا پێ خۆشتر لەوەیە کە لە ژێر تیشکی خۆرایە». هەروەها: «هێژاترین وشە لەلای پەروەردگار، ئەم چوار وشەن». دیسان فەرمووی: «دوو وشە هەیە کە سووکە لەسەرزار، قورسە لە کێشان و هێژایە لە کن پەروەرندەی جیهان: "سُبحانَ الله وَ بحمده، سُبحانَ الله العَظیم"». هەژاران گلە و گازندەیان بردە پەرای پێغەمبر و گوتیان: «دەوڵەمەندان نووکوبەدی خێری دوارۆژیان بردووە، چونکە ئەوەی ئێمە دەیڵێین، ئەوانیش دەیڵێن؛ بەڵام ئەوان خێر دەدەنە هەژاران، کە چی ئێمە نا». لە وەرامدا فەرمووی: «ئەنگۆ چونکە هەژارن، هەر تەلیلە و تەکبیر و تەسبێحیکتان سەدەقەیەکە؛ هەروەها هەر فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپەیەکتانیش هەر

سەدەقەیە. ئەگەر ئەنگۆ پارووە نانێک بنێنە سەرزاری خێزانتان، خۆی سەدەقەیەکە». ئەوەش بزانە بایەخی تەسبیح و تەلیلە و زیکری هەزاران بۆیە پترە، چونکوو دونیا دڵی ڕەش نەکردوون و دڵیان پاک و خاوێن و بێخەوشە و هەر وشەیەک لەسەر دڵیان وەکوو توویەک لەسەر خاکێکی پڕپیتدا ڕۆدەچێ و بەردەوام هەڵدەکشێ؛ کەچی یادی خودا لەدڵێکی تێک ئاڵاو دەگەڵ شاوەتی دونیا، وەکوو توویەکی چاندراو لەنێو شۆرەکاتە، کەمتر بەردەدا.

**سەڵەوات** - ڕۆژێک پێغەمبەر لە ماڵ هاتە دەر، گەلێک شاد و بەکەیف بوو؛ گوتی: «جوبرەئیل هاتووەو گوتوویە: "مزگێنی بێ! پەروەردگار گوتی : ئەگەر یەکێک لە ئوممەتی تۆ سەڵواتێکت بۆ بنێرن، من دەجار سەڵواتی بۆ دەنێرم، کە جارێک درووودت بۆ بنێرێ، من دە جار درووودی لێ دەکەم، فریشتەکان ونزیکەکانیشم هەروا».

پێغەمبەر فەرمووی : «هەرکەس سەڵواتم بۆ بنێری سەر لە بەری فریشتەکان سەڵەواتی بۆ دەنێرن؛ جا پێتان خۆشە کەم بنێرن یا زۆر». دیسان فەرمووی: «ئەوەی زۆرتر سەڵواتم بۆ بنێرێ، لە کن من هێژاترە». دیسان: «ئەوەی سەڵواتێکم بۆ بنێری، دە خێری بۆ دەنووسرێ و دە گوناحی دەسرێتەوە». هەروەها: «هەرکەس لە پەرتووکێکدا کە دەینووسێ، سەڵواتم بۆ بنووسێ، تا ئەو سەڵواتە لەو کتێبەدا بێ، فریشتەکان لە لای خوا لێبۆردنی بۆ دەخوازن».

**نکای لێبوردن**: ئیبنی مەسعوود دەڵێ : «دوو ئایەت لە قورئاندا هەیە کە ئەگەر کەسێک تووشی گوناح بێ و ئەو دووە بخوێنێ و داوای لێبۆردن کاو لەگوناح پاشگەز بێ، گوناحی دەسرێتەوە :

وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ[1]، وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا[2].

خودای مەزن بە پێغەمبەری فەرموو : «فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا»[3]. بۆیە

---

١ - قورئان (١٣٥/٣) ئەو کەسانەی هەرگا کاری خراپ دەکەن، یا ناحەقی لە خۆ دەکەن، خودا لەبیر نابەنەوەو لە بەری دەپاڕێنەو کە خەتاکانیان ببوورێ.(هـ)

٢ - قورئان (١١٠/٤) هەر کەسێکیش کارێکی ناڵەبار بکا، یان غەدرێکی لە خۆ بکا، پاشان لە خودا بخوازێ کە بیبەخشێ، دەبینێ کەخودا لێ بوورو دڵۆڤانە. (هـ)

٣ - قورئان (١١٠ / ٣) هەر تاریف و شوکری پەروەرندەت بکە وداوای بووردنی لێ بکە. ئەو هەمیشە پەژیوانی پەژیوانان قبووڵ دەکا. (هـ).

پێغەمبەر زۆری دەگوت: «سُبْحانَکَ اَللّهُمّ وَبِحَمْدکَ. اَللّهُمّ اغْفِرلی اِنّکَ اَنتَ التوّابُ الرّحیم[1]».

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس فرە داوای لێبوردن کا، لە خەم و پەژارە رزگار دەبێ و تەنگ و چەڵەمەی فرەە[2] دەبێ و رزقی لەو شوێنەی بیری لێ ناکا، دەگا». گوتی«من هەر رۆژ حەفتا جار لێبوردن دەخوازم». کە پێغەمبەر وای کرد، دیارە خەڵکیتر دەبێ چ بکەن و نابێ لە لێبوردن خواستن هەدا بدەن. دیسان فەرمووی: «هەرکەس لە کاتی خەوتنان سێ جار بڵێ "اَستَغْفِرُ اللهَ الّذی لا الاهُوَ الْحَیُّ الْقَیّوم"، هەموو گوناحەکانی دەبەخشرێن، هەرچەند بە قەدەر کەفی زەریاو وردو زیخی بیاوان و لق و پۆپ و گەڵاو چڵی دارەکان و رۆژەکانی دونیا بن». دیسان گوتی: «هەر مرۆڤێک کە تووشی گوناحێ بێ و پاش ئەوە تارەت بگرێ و دەسنوێژ بشواو دوو رەکات نوێژ بخوێنێ و داوای لێبوردن کا، خوا لەگوناحی خۆش دەبێ».

## نەریتەکانی دوعا

پێغەمبەر فەرمووی : «دوعا و گازە، کاکڵەی پەرستن و عیبادەتە». هۆکەشی ئەوەیە کە مەبەست لە عیبادەت، پەرستنە و پەرستنیش بەوە دەبێ کە ملکەچی خۆی و گەورەیی پەروەردگار پێکەوە ببینێ و بزانێ هەردووی ئەمانە لە دوعا دەست دەکەون. هەرچەن کزاڤ و لالانەوەی پتر بێ، چاترە.

بۆ دوعا دەبێ هەشت نەریت بەجێ بێنێ:

**یەکەم** – هان بدات لەکاتی هێژای وەکوو عەرەفە، رەمەزان، هەینی و دەمەو بەیانی و نیوەشەو دوعا کا.

**دووەم** – هان بدات دوعای لە بارودۆخێکی هێژادا بێ، وەکوو : کاتی خەزا لەگەڵ کافران، کاتی بارینی باران، کاتی نوێژانی فەرز (لە خەبەردا هاتووە کە لەم کاتانەدا دەرکەکانی ئاسمان ئاوەڵان)؛ هەروەها لە نێوان بانگی نوێژ و بانگی قامەت، کاتێ رۆژووە، کاتێ دڵ بە هەستتر و ناسکترو بەکوڵترە؛ چونکە کوڵی دڵ، هۆی کرانەوەی دەرکی رەحمەتە.

**سێیەم** – هەر دوو دەستی هەڵبڕێ و لەکۆتاییدا بەسەر روویدا بیساوێ؛ لەخەبەردا هاتووە کە: «پەروەردگار بەخشندەتر لەوەیە کە دەستێ کە بەرەو ئەو هەڵبڕاوە بە بەتاڵی بینێرێتە دواوە». پێغەمبەر فەرمووی: ئەوەی دوعا بکات، لەم سێ شتە بەری نابێ: یان گوناحی دەسڕێنەوە، یان لەو کاتە خێرێکی پێ دەگا، یا خۆ لە داهاتوودا خێری دەگاتێ».

**چوارەم** – ئەوەیە کە بەدرِدۆنگی دوعا نەکاو ئارخەیان بێ کە ئەم دوعایە گیرا دەبێ، چونکە

---

١. پەروەردگارم! پاک و بێخەوشی و شوکرانەت دەکەم. خوایا! لێم ببوورە، چونکە تۆ لێبوور و دلۆڤانی.

٢. فرەهـ: گوشاد.

پێغەمبەر فەرمووی : «اُدْعُوااللهَ وَاَنْتُمْ موُقِنُونَ بِالا جابَه»[1].

**پێنجەم** - ئەوەیە کە بەگریان و پاڕانەوەو مل‌کەچی و تەیاری دڵەوە دوعا بکات، چونکە لە خەبەردا وا هاتووە: «لەدڵی بێ ئاگا هیچ دوعا نابیسرێ».

**شەشەم** - لە دوعا و نوێژدا سوور بێ و پێداگری کاو دەرکی خودا بەرنەداو نەڵێ: گەلێک تکام کردو هیچ وەرامم لێی نەگرت؛ چونکە خودا کاتی پەرسڤی دوعا باشتر لە ئەنگۆ دەزانێ. کە وەلامی درایەوە، سونەتە بلێ: «اَلْحَمْدُللهُ الذّی بِنعمته تَتمّ الصّالحات». کە دێر وەلامی درایەوە و بلێ: اَلحَمدُ لله علی کلّ حال»[2].

**حەوتەم**- ئەوەیە کە سەرەتا تەسبێحات کا و سەڵوات بنێرێ. پێغەمبەر بەرلە دوعا دەیگوت: «سُبحانَ رَبی الأعلی الوَهّاب»[3]. هەروەها گوتوویە: «هەرکە ویستی دوعا بکا، سەرەتا سەڵوات بۆ من بنێرێ؛ چونکە بێ‌گومان پەروەردگاری مەزن وەرامی سەڵوات دەداتەوە و گەلێک لەوەش دەهندەترە لە دوو دوعا یەکیان وەرام بداتەوە و یەکیان نە».

**هەشتەم**- ئەوەیە کە لە گوناحان پاشگەز بێ و دڵی بە تەواوی لە پەرای پەروەرێنەری بێ، چونکە زۆربەری ئەو تکا و سکالانەی کە وەرناگیرێن و وەرام نادرێنەوە، لە سۆنگەی زەنگاری گوناح و بێ‌ئاگاییە بەسەر دڵدا. کەعبی ئەحبار دەیگوت: «لە نێو نەتەوەی بەنی ئیسرائیلدا وشکە ساڵ هات. مووسا دەگەڵ نەتەوەکەی بۆ خوێندنی نوێژی باران روویان لە چۆل و دەشت نا. سێ جار نوێژیان کرد و هیچ وەرامیان نەدرایەوە. خودا وەحی ناردە سەر مووسا و پێی گوت: "فیتنەیەکتان دەنێودایە، بەو بۆنەوە سکالاتان لێ وەرناگیرێ". گوتی: "خوایا! ئەوە کێیە تا وەدەری نێم؟" خودا گوتی: "من ئەنگۆ لە فیتنەیی دوور دەکەمەوە، چۆن بۆ خۆم فیتنەیی کەم؟" مووسا گوتی: دەبێ هەمووومان لە فیتنەیی پەژیوان و لە گوناح پاژگەز بینەوە". کە وایان کرد، باران داباری».

مالکی دینار گوتی: لە نێو نەتەوەی بەنی‌ئیسرائیلدا سیاساڵ هات، بۆ خوێندنی نوێژی باران روویان لە دەشت نا، کەچی هیچ وەرامیان پێ نەدرا. وەحی نێردرایە سەر پێغەمبەریان و پێی گوتن: «بە لەشی پیس و ورگی هەڵمساو لە ماڵی حەرام و دەستی سوور بە خوێنی ناڕەوا، دوعای چی دەکەن؟ بۆ ئەم هاتنە دەشتەتان گەلێک لێتان تووڕەتر بووم، بۆیە تا دەتوانن لێم دوور کەون».

---

١ - لەخودا بپاڕێنەوەو دلنیابن کە وەرامتان دەداتەوە.

٢ - سوپاس بۆ خودایەک کە بە چاکەی ئەو کارە چاکەکان جێ‌بەجێ دەبن.

٣- لە هەموو بارودۆخێکە سوپاس هەر بۆ خوایە.

## دوعای رێکەوت

دوعای وەرگێڕاو لە پێغەمبەرو یارانی گەلێک زۆرە، کە پێغەمبەر خۆی لەبەیانان و شەوان، پاش نوێژان و لە کاتی جۆراوجۆردا خوێندوویەو فرمانی بۆ خوێندنی داوە. گەلێک لەمانەمان لە کتێبی «احیاء» داکۆوە کردووە و چەند دوعایەکی بەدەوترمان لە کتێبی «بدایە الهدایە»دا هێناوە: ئەوەی پێی خۆشە فێری ئەو دوعایانە بێ سەیری ئەو کتێبانە کا، چونکە نووسینی لەم کتێبەدا کاتی زۆر دەباو زۆربەیان بەناوبانگ و ناسراون و زۆرکەس دەیانزانن.

چەن دوعایەک کە لە کاتی کارەسات، یان رووداوێک کە دێتە گۆڕێ، خوێندنیان سوننەتەو کەم کەس دەیزانن و لێرە دەینووسین، تا هەمووان فێری بن و لەواتاکەشی تێبگەن و لەکاتی خۆیدا بیخوێنن؛ چونکە بێ گومان لەهیچ کاتدا نابێ مرۆڤ لە پەروەرێنەری بێ ئاگا بێو دەستی نیازی نەوی و چاوی گریانی ویشک بێ.

لە کاتی هاتنە دەر لە ماڵ دەبێ بڵێ : «بِسم الله، رَبِّ اَعُوُذبِکَ اَنْ اَضِلَّ اَو اُضِلَّ اَو اَظلَمَ اَو اَجهَلَ اَوُ یُجْهَلَ عَلَیّ. بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِیم. لاحَولَ وَلا قُوَةَ الا بالله، وَالتّکلانُ عَلَی الله»[1].

کە رۆیشتە نێو مزگەفت بڵێ: «اَللّهُمْ صَلّی عَلَی مُحَمّدٍ وَعَلَی آلِ مُحَمَّدٍ وَسَلّم. اَللّهُمَّ اغفِرْلِی ذُنُوبِی، وَفْتَحْ لِی اَبوابَ رَحْمَتِکَ»[2]؛ پاشان پای ڕاستی دابنێ.

کە لە کۆڕێکدا بەشدار بوو کە قسەی بێکەڵکی تێدا دەبێژرا، کەفارەی ئەوەیە بڵێ: «سُبْحانَکَ اَللّهُمَّ وَبِحَمْدِکَ. اَشْهَدُ اَنْ لااِلهَ الا اَنْتَ اسْتَغفِرُکَ وَاَتوبُ اِلَیْکَ، عَمِلْتُ سُوءً وَظَلَمْتُ نَفْسِی، فَاغْفِرْلِی ذُنُوبِی فَاِنَّ الذُّنوبَ لایَغفِرُها الا اَنْت»[3].

کە رۆیشتە نێو بازاڕ بڵێ: «لااِلهَ الاوَحْدَهُ لاشَرِیکَ لَهُ، لَهُ الْمُلْکُ وَلَهُ الْحَمْدُ، یُحْیی وَیُمیتُ، وَهُوَ حَیٌ لایَموُتُ، بِیَدِهِ الْخَیرُ، وَهُوَ عَلی کُلِّ شَیءٍ قَدیر»[4].

کە جلکی نوێی دەبەر کرد بڵێ: «اَللّهُمّ کَسَوتَنی هذَا الثّوبَ، فَلَکَ الْحَمْدُ، اَسْاَلُکَ مِنْ خَیْرِهِ وَخَیْرِ ما صُنِعَ لَهُ

---

١ - وەناو خودا. پەروەندەم هانا دەبەمە بەر تۆ لەوەی کە لاڕێ بم یا خۆ کەسێک بخەمە سەر لاڕێ، لە ستەم کردن یان ستەم لێچون، لە کردەی نەزانانە کردن یان دیتن. وەناو خودای دەهندەو دلۆڤان. بێجگە لەخوا کەس هێزو خوستی نییە، پشت بەستن هەر بە خوایە.

٢ - خوایا! درووود و سلاو بنێرە سەر محەممەدو تۆرەمەی چاکی. خوایا لە گوناحانم خۆش بەو دەرگانەی بەزەیی خۆتم بۆ بکەرەوە.

٣ - خوایا! پاک و بی خەوشی، سوپاس بۆ تۆیە. شایەتی دەدەم بێجگە لە تۆ خودایەک نییە. داوای لێبووردنت لێ دەکەم و بەرەو لای تۆ دەگەڕێمەوە. خراپەم کرد و ستەمم لەخۆم کرد، لە گوناحانم خۆش بە، بێجگە لە تۆ کەس لەگوناحانم خۆش نابێ.

٤ - بێجگە لە «اَللّە» خوایەک نییە، تاقانە و بی هامبازە، پادشایی و پەرستن بۆ ئەوە، زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێ و خۆشی زیندووی هەتاهەتاییە. چاکە بە دەستی وییەو بە سەر هەموو شتدا زاڵە.

وَأَعوُذُبِکَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ ما صُنِعَ لَه»[1].

کە مانگی نوێی دی بڵێ: «اَللّهُمَّ اَهِلَّهُ عَلَيْنا بِالأَمْنِ وَالايمانِ وَالسّلامَةِ وَالسلامِ، رَبّي وَرَبُّکَ الله»[2]. لە کاتی شنیانی بادا بڵێ: «اَللّهُمَّ اِنّي اَسْأَلُکَ خَيْرَ هذِهِ الرّيحِ وَخَيْرَ ما فيها وَخَيْرَ ما اُرْسِلَتْ بِهِ. وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّها وشَرِّ ما فيها وَشَرِّ ما اُرْسِلَتْ بِه»[3].

کە هەواڵی مەرگی کەسێکی بیست، بڵێ: «سُبْحانَ الْحَيِّ الّذي لايَمُوتُ، اِنّا لله وَاِنّا اِلَيْهِ راجِعُون»[4]. کە خێر وسەدەقەی دایە کەسێک دەبێ بڵێ: «رَبَّنا تَقَبَّل مِنّا اِنَّکَ اَنْتَ السَّميعُ الْعَليم»[5]

کە زیانێکی لێ کەوت بڵێ: عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ[6].

لە سەرەتای هەر کارێکدا بڵێ: إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا[7].

کە سەیری عاسمانی کرد، بڵێ: «رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ تَبَارَكَ ٱلنَّارِ[8]. ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا[9].

کە دەنگی هەورو تریشقەی بیست، دەبێ بڵێ : «وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ»[10].

---

١ - سپاس بۆ تۆ پەروەرەندەم کە ئەم جلکەت دەبەرم کرد، چاکەی ئەم بەرگەو چاکەی دەبەر کردنیم لەتۆ دەوێ، هانات دەبەمە بەر، لە خراپەی ئەم بەرگەو خراپ بە کار هێنانی.

٢ - خودایا! ئەم مانگەم هاورێ لە گەڵ ئارخەیان و بڕواداری و تەندروستی و ئیسلام بێ. ئەی مانگ! پەروەردندەی من و تۆ خودایە.

٣ - خوایا! چاک بوونی ئەم با و ئەوەی تێیدایە و ئەوەی لە گەڵیدایە لە تۆم دەوێ. لە خراپەی ئەم با و ئەوەی تێیدایە و ئەوەی لە گەڵیدایە پەنات پێ دەبەم.

٤ - پاک و بێ خەوشە پەروەردگارێ کە قەد نامرێ. ئێمە هەر لەوین و بۆ لای وی دەگەڕێنەوە.

٥ - پەروەرندەم! لێمی وەربگرە، تۆ بیسەر و زانای.

٦ - (قورئان؛ ٣٢/٦٨) شایەتا پەروەرندەمان لەوە چاترمان بداتێ؛ ئۆمیدمان هەر بە پەروەرندەی خۆمانە. (هـ)

٧ - قورئان (١٠/١٨) کاتێ لاوەکان پەنایان بۆ غارەکە برد و گوتیان: ئەی پەروەرێنی هەموومان! تۆ بەر بەزەیی خۆتمان بخە و کارەکانمان بۆ مەیسەرکە. (هـ)

٨ - قورئان (١٩١/٣) ئەی پەروەرندەمان تۆ ئەم دەزگایەت بە فێڕۆ ساز نەداوە، پاکی و بێ عەیبی بۆ تۆیە؛ هەر خۆشت لە ئازاری بە ئاگرمان بپارێزە. (هـ).

٩ - قورئان (٦١/٢٥) سەروەری بۆ ئەو کەسەیە چەند قۆناغی لە عاسمانا دامەزراندو لە ناو ئەمدا چرایەک و هەیڤێکی تریفەداری جێ کردەوە.(هـ).

١٠ - (قورئان ١٣/١٣) هەورەکان و فریشتەکان – لە سامی ئەم – هەمیشە هەر پەسن دەدەن.(هـ).

کاتێ برووسکەی دی بڵێ: «اَللّهُمَّ لاتَقْتُلْنا بِغَضَبِکَ وَلا تُهْلِکْنا بِعَذابِکَ وَعافِنا قَبْلَ ذالِکَ»[1]. کاتی بارینی باران بڵێ: «اَللّهُمَّ اجْعَلْهُ سَقْیاً هَنیئاً وَصَبّاً نافِعاً وَاجْعَلْهُ سَبَبَ[2]. رَحْمَةٍ وَلاتَجْعَلْهُ سَبَبَ. عَذابٍ»[3].

کاتی تووڕەبوون بڵێ: «اللهم اغفرلی ذنبی و اذهب غیظ قلبی، و اجرنی من الشیطان الرجیم»[4].

کاتی ترس و دڵەڕاوکێ بڵێ: «اَللّهُمَّ اَنّا نَدرَأُبِکَ[5] فی نُحُورِهِمْ وَنَعُوذُبِکَ مِنْ شُرُورِهِم»[6].

کاتێک شوێنێکی نیشتە ژان دەست لە سەری دابنێت و بڵێ: بسم‌الله -سێ جار- وَقُدْرَتِه مِنْ شَرِّما اُجِدُ وَاُحاذِرُ»[7]- حەوت جار.

کە خەم و پەژارە دایگرت بڵێ: « لااِلهَ الا اللهُ الْعَلِیُّ الْحَکیم، لااِلهَ الااللهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظیم »[8].

کە لە کارێکدا داما، بڵێ: «اَللّهُمَّ اِنیّ عَبْدُکَ وَاْبنِ عَبْدِکَ وَاْبنِ اُمَتِکَ، ناصِیَتی بِیَدِکَ، ماضٍ فی حُکْمِکَ، نافِذٌ فی قَضائِکَ، اَسْاَلُکَ بِکُلِّ اسْمٍ سَمَّیْتَ بِه نَفْسِک وَاَنْزَلْتَهُ فی کِتابِکَ وَاَعْطَیْتَهُ اَحَدً مِنْ خَلْقِکَ وَاسْتَاْثَرْتُ بِه فی عِلْمِ الْغَیْبِ عِنْدِکَ، اَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبیعَ قَلْبی وَنُورَ صَدْری وَجَلاءَ غُمّی وَذَهابَ حُزْنی وَهَمّی»[9].

کە سەیری ئاوێنەی کرد بڵێ: «اَلْحَمْدُلِلّه الّذی خَلَقَنی فَاَحْسَنَ خَلْقی وَصَوَّرَنی فَاَحْسَنَ صُورَتی»[10].

کە کۆیلەیەکی کڕی، دەست بە جەمینیەوە بگرێ و بڵێ: «اَللّهُمَّ اِنیّ اَسْاَلُکَ خَیْرَه وَخَیْرَ ماجُبِلَ عَلَیْه، وَاَعُوذُبِکَ مِنْ شَرِّ ما جُبِلَ عَلَیْه»[11].

کاتی نووستن بڵێ: «رَبِّ بِاسْمِکَ وَضَعْتُ جَنْبی، وَبِسْمِکَ اَرْفَعُهُ، هذِهِ نَفْسی اَنْتَ تَتَوَفّاها، لَکَ مَماتُها

---

١ - خوایا! بە رقی خۆت مەمانکوژە و بە عەزاوی خۆتمان تووش مەکەو بەر لە تووش بوون، لێمان ببوورە.

٢ - لە «احیاء العلوم»دا : «صیب» (شەستە رەهێڵە) هاتووە.

٣ - خوایا! ئەم بارانە بکە بە ئاوێکی پاراو و بێ خەوش و پڕ قازانج بومان. ئەمە بکەرە هۆی خێروبێری زۆروزەوەنـد و مەیکـەرە هـۆی ئازار و سزامان.

٤ - خوایا! لە گوناحم ببوورە و تووڕەییم پیش بخواتەوەو لە شەیتانی دەرکراوەم بپارێزە.

٥ - لە ئەحیادا هاتووە کە : «انا نجعلک».

٦ - خوایا بەیارمەتی تۆ دەدەینە سەرسنگی دوژمنانماندا و لەئازاریان هانات پێ دەبەین.

٧ - پەنا دەبەمە بەر پەروەردگارم، لەزیانی ئەو شتەی دەیبینم و خۆمی لێ دەپارێزم.

٨ - بێجگە خوای بەرزو زانا، خودایەک نییەو بێجگە لە خوای عەرشی گەورە هیچ خودایەکی‌تر نییە.

٩ - خوایا! من بەندەی تۆ و کوڕی بەندەی تۆ و کوڕی کارەکەری تۆم. گوێم لە فەرمانتە، دەستوورت لە سەرسەرم دایـەو ئـەوەی تـۆ بۆمت رەچاو کردبێ لە سەر چاوەمە. تکات لێ دەکەم بە هەر ناوێک کە لە سەر خۆتت ناوە، یان لـە کتێبتـدا ناردۆتـە خـوارێ، یـا بـە یەکێک لە ئافەریدەکانت بەخشیوە، یان بە زانستی غـەیبی خـۆت رازاندۆتـە، قورئـانم بـۆ بکـەرە بـەهاری دڵ و رووناـکی سـینگم و روونکەرەوەی خەمەکانم و تارێنەری کەسەر و پەرێشانی و ژاکاویم.

١٠ - سوپاس بۆ پەروەردگارم کەبە شووشەیی خولقاندمی و رووەمەتێکی جوانی دامێ.

١١ - پەروەردگارم! چاکەو ئاکار بەرزی ئەم کۆیلەم لە تۆ دەوێ و لە سووکی و نزمی ئاکاری پەنا دەبەمە بەر تۆ.

وَمَحْياها، انْ اَمْسَكْتَها فَاغْفِرلَها وَانْ اَرْسَلْتَها فَاحفَظْها بِما تحْفَظُ بِه عِبادَكَ الصالحين»[1]

کاتی لەخەو رابوو بڵێ: «اَلْحَمْدلله الَّذی اَحْيانا بَعْدَ مااماتَنا وَاِلَيْه النُّشُور، اَصْبَحْنا وَاَصْبَحَ الْمُلْكُ لله وَالْعَظَمَةُ وَالسُّلْطانُ لله وَالْعِزَّةُ وَالْقُدْرَةُ لله، اَصْبَحْنا عَلى فِطْرَةِ الْاسْلامِ وكَلِمةُ الاخْلاصِ، وَعَلى دِينِ نَبِيِّنا مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ وَ عَلى مِلَّةِ اَبينا ابراهيم حَنيفاً وَماكان من الْمُشْرِكين»[2]

---

١ - بە ناوی تۆوە پەروەردگارم رادکشێم و بەناوی تۆوە رادەبم. ئەمە نەفسی منە کە تۆ هەموویت گرتۆتە ژێر دەستی خۆت، مان و نەمانی لەدەستی تۆیە، ئەگەر مراندت لێی ببوورمو ئەگەر ژیاندت، بەوەی دەیکەیتە بەشی ئەوانەی چاکت دەگەڵ کردوون، ئەمیش بژیونە.

٢ - سوپاس بۆ خودایەک کەپاش مردن زیندوومان دەکاتەوەو رۆژی پەسلان لەلای وییە. ئێمەو پادشایی جیهان هی خودایێ، گەورەیی و دەسەلات هی ئەوە. لەسەر دینی ئیسلام و بۆ پاکی خولقاوین، لە سەر دینی پێغەمبەرمان موحەممەد و ڕێبازی کالمان ئیبراهیمی پاکی تاک پەرست کە قەد هامبازی بۆ پەروەردگار دانەنا.

## بنەمای دەهەم – ریزی ویردەکان

هەروەکوو لە سەردێڕی موسوڵمانیدا هاتە گوتن، مرۆ بۆ بازرگانی نێردراوەتە ئەم جیهانی ئاو و گڵە؛ ئەگینا راستەقینەی رووح هی عالەمی سەرووە و لەوێڕا هاتووەو بۆ ئەوێ دەگەڕێتەوە. سەرمایەی مرۆڤ لەم توجارەتەدا، تەمەنیە و ئاشکرایە کە ئەم سەرمایەیە بەردەوام لە کەمبوونایە: ئەگەر بۆ هەر هەناسەیەکی، قازانجێکی دەست نەکەوێ، سەرمایەکەی بەخەسار دەڕواو بێجگە لە فەوتان ئەنجامی نییە. بۆیە خودای دلۆڤان گوتی: «وَٱلۡعَصۡرِ إِنَّ ٱلۡإِنسَـٰنَ لَفِى خُسۡرٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ»[1].

ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە سەرمایەکە سەهۆڵەو لە دوڕی هاویندا لە نێو بازاڕ رایناوەو هەلالەی بۆ دەکاو دڵێ: «موسوڵمانان! بەزەییتان بەکەسێکدا بێتەوە کە سەرمایەکەی لە توانەوەیە». سەرمایەی تەمەنیش هەروا بەردەوام کەم دەبێتەوە. چونکە نووک و بەدی تەمەنی مە، چەن هەناسەیەکە لە لای پەروەردگار. ئەوانەی لە گرینگی ئەم بابەتە گەیشتن، بەتەمەنی خۆیان راگەیشتن و تێگەیشتن کە هەر هەناسەیەکی گەوهەرێکە کە بەختەوەری دوارۆژی پێ دەکڕن و پتر لەو کەسەی کە سەرمایەی زێڕو زیوە، چاودێری سەرمایەیان دەکەن. ئەم چاودێرییە بەم چەشنەیە کە شەو و رۆژی ژیانیان دابەش کردووە بۆ کاری چاک و هەر کارێکیان لە کاتێکدا داناوەو ویردێکیان بۆ دیاری کردووە.

بەلام ویردیان بۆیە داناوە تا کات و ساتیان نەفەوتێ، چونکی زانیان کەسێک بەختەوەری دوارۆژی دەبێتە نسیب، کە کاتی مالاوایی لەم جیهانە، خۆشەویستی و هۆگری پەروەردگاری لە دڵدا سەقامگیر بووبێ. هۆگری تەنیا بە زۆری یادکرنەوە دێتە ئاراوە و خۆشەویستیش تەنیا بەناسین.

---

[1] - قورئان(۱۰۳/ ۱، ۲، ۳) سوێند بەهەڕەتی ئێوارە، مرۆڤ گشتی زیانبارە، مەگین ئەوەی بوونەتـە خـاوەن بـاوەڕو کارچـاک بـوون. (هـ).

ناسینیش بە تێڕامان و بیرکردنەوە دێتە ئەنجام. کەواتە ڕامان ویادکردنەوە، تووی بەختەوەرین. دووری لەدونیا و شاوەت و گوناح بۆ ئەوەیە دەرفەت و هەلی ڕامان و یادکردنی پەروەردگاری دەست کەوێ.

بەردەوامی زیکر بە دوو چەشنە:

**یەکەم** ئەوەی کە بەردەوام بەدڵ -نەک بە زمان- بڵێ «الله الله»؛ بەدڵیش نەڵێ، چونکە گوتن وەکوو ئاخاوتنی لەشە؛ بەڵکوو بەردەوام خەریکی سەیری ئەم پەیڤە بێ و هیچ لێی نەبڕێ. بەڵام ئەمە ئێجگار دژوارو لەتاقەت بەدەرەو کەم کەس پێی دەکرێ بەردەوام دڵی بپەرژێنێتە سەر کارێ و وەڕەز نەبێ. لەم سۆنگەوە ویردی جۆراوجۆریان دانا؛ هەندێ بەلەش وەکوو نوێژ، هەندێ بەزار وەکوو قورئان خوێندن، هەندێ بەدڵ وەکوو بیرکردنەوە وڕامان، تا کەس وەڕەس نەبێ.

**دووهەم** ئەوەیە ئەو کاتانەی کە بە ناچار دەبێ بپەرژێتە سەرکاری دونیا، لە کاتی ویرد و عیبادەت هەڵاوێرێ و هەرچەن پێی ناکرێ هەموو کاتی خەریکی کاری دواڕۆژ بێ، لانی کەم زۆربەی کاتی بۆ ئەم کارە بێ، تا تای چاکەکانی قورستر بێ؛ چونکە ئەگەر نیوەی کاتی بپەرژێتە سەرکاری ڕەوای دونیایی و ئەو نیوەی‌تری خەریکی عیبادەت بێ، شایەتا تای کاری دونیای قورستر بێ؛ چونکی هەست و سروشتی مرۆڤ ئەو کارەیان پێخۆشە کە لە گەڵیان سازگار بێ و ئاشکرایە کە دڵ خەریکی دین کردن بەئاوەژووی سروشتی مرۆیە و یەک دڵی و پاراوی تێیدا گەلێک دژوارەو بە بێ یەک دڵیش هەر کارێ بکرێ، بێ قارانجەو گەلێک کاری چاکەی دەوێ تا یەکێکیان بە پاراوی بێتە دەر.

کەواتە، دەبێ زوربەی کاتەکان خەریکی کاری دین بێ و کاری دوارۆژ بە دوای ئەو بێ. بۆیە پێغەمبەر لە زمان خوداوە گوتی: وَمِنْ ءَانَآيِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ[1]. دیسان گوتی: وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلاً[2]. وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلاً طَوِيلاً[3].دیسان گوتی: كَانُواْ قَلِيلاً مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ[4]. سەر لە بەری ئەمانە ئاماژە بەوەن کە زۆربەی کاتەکان خەریکی پەسنی پەروەردگار بن. ئەمەش تەنیا بەدابەش‌کردنی کاتی شەو و ڕۆژ دەگاتە ئەنجام؛ بۆیە ڕاڤە و ڕوونکردنەوەی ئەم بەشە پێویستە.

---

١ - قورئان(٢٠/١٣٠) لە بەتڵەکانی شەوێدا و لە هەر دوو ئالی ڕۆژێدا سەرگەرمی سوپاسی ئەو بە، بەشکوو بە ئاواتت بگەی. (هـ)

٢ - قورئان (٧٦/٢٥) هەرناوی پەروەرندەی خۆت بەیاد کە؛ هەموو بەرەبەیانان و ئێوارانیش. (هـ)

٣ - قورئان (٧٦/٢٦) بە شەویش سوجدەی بۆ بەرە و لە درێژایی شەوگاریشدا هەر پەسنی پاکی ئەو بدە. (هـ)

٤ - قورئان(٥/١٧) شەوان کەمتر دەخەوتن.

## لێکدانەوەی ویردەکانی ڕۆژ

لە ڕۆژدا پێنج ویردە:

**ویردی یەکەم**: لە بەرەبەیانەوە تا خۆرکەوتن. ئەمەش کاتێکی هێژایە کە پەروەردگار سوێندی پێ خواردووەو گوتوویە: وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ[1]. دیسان فەرمووی: قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ[2]، هەروەها: «فایقُ الاصباح[3]»، هەموو ئەمانە دەڵێن: دەبێ لەم کاتەدا بە وردی چاودێری کاتت کەی و هیچی لێ نەفەوتێنی.

کە لەخەو هەستا دەبێ بڵێت: «اَلْحَمْدُ للّٰه اَلّذی اَحیانا بَعْدَ ما اَماتَنا وَ اِلَیه النُشُور.....». پاش گوتنی ئەم دوعایە، جلکی دەبەر کاو خەریکی زیکر و نزا بێ. کاتی جلک دەبەر کردن نییەتی خۆ داپۆشان و بەجێهێنانی دەستووری خوا کاو لە دوڕوویی خۆی لابدا. بۆ تارەت بڕواتە پێشئاو و سەرەتا پای چەپ دانێ. پاشان بەو جۆرەی پێشتر بێژرا دەسنوێژ بشواو دەم و دانی بشواو دوعاو زیکرەکانی بڵێ. سوونەتی بەیانی لە ماڵ بخوێنێ و پاشان بڕواتە مزگەفت؛ چونکوو پێغەمبەر وای کردووە. ئەو دوعایە کە ئیبنی عەبباس گوتوویە، پاش نوێژی سوننەت (لە کتێبی «بدایة الهدایة»دا نووسراوە) فێر بێ و بیڵێ.

بڕواتە مزگەفت و بە ئەسپایی سەرەتا پای ڕاستی دابنێ و دوعای چوونە ناو مزگەفت بخوێنێ و بە مەبەستی وەستان لە ڕیزی یەکەمدا بڕواتە ژوورێ. ئەگەر لە ماڵدا سوننەتی بەیانی نەخوێندووە، بیخوێنێ و ئەگەر خوێندوویە، نوێژی چوونە نێو مزگەفت بەجێبێنێ و تا بەستنی جەماعەت دانیشێ و خەریکی نزاو سکالا بێ. کە نوێژی بەیانی خوێندرا، تا خۆرئاوا لەمزگەوتدا بمێنێ؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «دانیشن لەمزگت تا کەوتنی خۆر، لە ڕزگارکردنی چوار کۆیلە لە لام هێژاترە». تا کەوتنی خۆر دەبێ خەریکی چوار ویرد بێ: نزاو تەسبیحات و قورئان خوێندن و بیرکردنەوە.

کە سلاوی نوێژی دایەوە، سەرەتا دوعا بکاو بڵێ: «اَللّهُمَّ صَلّی عَل مُحَمّدٍ وَعَلی آلِ مُحَمّد. اَللّهُمَّ اَنْتَ السَّلامُ ومِنْک السّلامُ والَیکَ یَعودُ السّلامُ حَیّنا ربَّنا باالسَّلام واَدْخلنا دارَ السّلام تَبارکْتَ یا ذُالْجلالِ والاکرام»[4].

پاش ئەوە نزای ئەم ساتە لەکتێبی «احیا»دا هاتووە، فێری بێ و بیخوێنێ.

---

١ - قورئان (١٨/٨١) بە سپێدە، کاتێ هەناسەی پێدا دێ.(هـ).

٢ - قورئان (١/١١٣) بێژە من خۆ دەپارێزم بە وەدی هێنی بەرەبەیانان (هـ).

٣ - (قورئان، ٩٦/٦) تیکۆلی بەیانان.

٤ - خوایا! درووود بنێرە سەر پێغەمبەر و تۆرەمەی. خوایا تۆ سـلاوی و سـلاو لـەتۆیـەو بـەرەو تۆیـە. پەروەرێنـەرم بـە درووودو سـلاو بەختەوەرمان کا و لە بەهەشتدا جێمان بکەرەوە. پیرۆز و بەودمی ئەی خاوەن گەورەیی و دلاوایی.

کە لە سکاڵا بووەوە، بپەرژێتە سەر تەلیلەو هەر یەکەیان سەد یان حەفتا یان دە جار بڵێتەوە. کە دە ویردی، هەر یەکە و دە جار گوت، سەرجەم دەبێتە سەد جار؛ نابێ لە سەد جار کەمتر بێ. لەخێر و ودمی ئەم زیکرەدا خەبەری زۆر بێژراوە، بەلام لێرە نەمانهێناوە تا باسەکە درێژ نەبێتەوە.

یەک- لاالهَ الاالله وَحْدَهُ لاشَریکَ لَهْ. لَهُ الْمُلْکُ ولَهُ الْحَمْدُ، یُحْیی ویُمیتُ وَهُوَ حیٌ لایَموُتُ، بِیَدِه الْخَیْر، وهُوَ عَلی کُلِّ شَیء قَدیر.

دوو – لاالهَ الا اللهُ الْمَلکُ الْحَقُّ الْمُبین[1].

سێ – سُبْحانَ الله وَالْحَمْدُ لله ولاالهَ الا اللهُ واللهُ اَکْبَرْ، ولاحَولَ ولاقُوَّةَ الا بِالله الْعَلِیِّ الْعَظیم.

چوار – سبْحانَ الله الْعَظیم وَبِحَمْده.

پێنج – سُبُّوحٌ قُدُّوس، ربُّ الْملائکَة وَالرُّوح.[2]

شەش – اَسْتَغْفِرُ اللهَ الذی لاالهَ الا هُوالْحَیُّ الْقَیّوم، وَاَسْأَلُهُ التَّوبَه.[3]

حەوت – یا حَیُّ یا قَیُّومْ بِرَحْمَتِکَ اسْتَغیثُ لا تعکْنی إلی نَفْسی طَرْفَةَ عَیْن، وَاَصْلِحْ لی شَأنی کُلَّه»[4].

هەشت – اَللّهمّ لامانِعَ لِما اَعْطَیْتَ وَلا مُعْطِیَ لِما مَنَعْتَ، ولا یَنْفَعُ ذَالجَدِّ مِنکَ الْجدُّ»[5].

نۆ – اَللّهُمّ صَلّی عَلی مُحَمّدْ وَعَلی آلِ مُحَمّد.

دە- بِسْمِ الله الّذی لایَضُرّمَعَ اسْمِه شَیء فِی الارْض وَلافِی اسّماء وهُوَ السّمیعُ الْعَلیم.

ئەم دە ڕستەیە، هەریەکە، دە جار یان زۆرتر بخوێنێ، چونکە لە خوێندنی هەر یەکەیاندا خێرو ودمێ شراوەیەو هەریەکەیان چێژو هۆگرییەکی تایبەتی هەیە. پاش ئەمە خەریکی قورئان خوێندن بێ و ئەگەر هیچی لەبەر نییە، لە «تفاریقات قوارع»[6] قورئان فێر بێ و بیخوێنێ؛ وەکوو «آیة الکورسی»[7]، «آمن الرسول»[1]، «شهد الله»[2] و، «قُلِ اللّهُمْ مالکَ الْمُلک»[3] و سەرەتای سوورەتی حەدیدو

---

[1] - بێجگە لە ئەللا پەروەردگارێک نییە، خونکارێکی بەراستی ئاشکرا.

[2] - پاک و بێ خەوش و پەسن کراوە، پەروەرندەی گیان و فریشتەکان.

[3] - بەرەو لای تۆ پاشگەز دەبمەوە.

[4] - ئەی زیندووی ڕاوەستاو! دەستی نیاز بەرەو دلۆڤانیت ڕادەکێشم، بۆ تاوێکیش بە حالی خۆم مەمهێلانەو هەموو کارێکم بە چاکی بەرێوە ببە.

[5] - خوایا! کەس بۆی نییە بەر بەخششی تۆ بگرێ و ئەوەش تۆ نەیبەخشی، کەس بۆی نییە بیبەخشێ. ئەوەش خێری تۆی پێ بگا، هیچ کۆشەوەیەکی ناوێ.

[6] - قەوارع کۆی قاریعەیە بە واتای کارەسات و ڕووداو یان دژوارییەکانی ڕۆژگار، یان ئەو شتە بە ترس و سامانە کە دڵ دەلەرزێنن. «تفاریقات قوارع» بریتییە لەو ئایەتانەی لە نێو قورئاندا بلاون و دێو و درنج و بەلاو مێمل دەتارێنن.

[7] - قورئان، ٢/٢٥٥.

کۆتایی سوورەتی حەشر.

ئەگەر ویستی دەتوانێ ئەو سوورەت و زیکرانەی کە خزری زیندە بە ئیبراهیمی تەیمی فێر کرد، بخوێنێ، کەخێر و وەدمی زۆروزەوەندەیە و پێی دەڵێن: «مُسَبَّعَات عشر»: ئەوەش دە شتە، هەر یەکە حەوت جار دەبێ بخوێنرین: «اَلحَمْد»، «اَلمعوذتین»[4]، «اخلاص»، «قُلْ یا اَیهَاالْکافرُون» و ئایەتولکورسی. ئەم شەشە لە قورئانن و ئەم چوارەش زیکرن:

یەک- سُبْحانَ الله وَالْحَمْدلله وَلاالهَ الااللهُ واللهُ اَکبَر.

دوو - اَللّهُمّ صَلّی عَلی مُحَمّدْ و عَلی آلِ مُحَمّد.

سێ - اَللّهُمّ اغفِرْ لِلْمُؤمِنینَ والْمؤمِنات.

چوار - اَللّهُمّ اَغفِرلی ولِوالدیّ وارحَمْهُما، وَفعَلْ بی وبِهِمْ عاجِلاً و آجِلاً فی الدّین وَالدُّنیا و الاخرةِ ما اَنتَ لَهُ اهل وَلاتَفعَلْ لنا یا مَولانا ما نَحْنُ اَهْلُهُ، اِنّکَ غَفُورٌ رَحیم[5]. خێروودمی ئەمە گەلێک زۆرەو لە«ئەحیا»دا بێژراوە.

پاش ئەمانە خەریکی رامان و بیرکردنەوە بێ. باس لە تێڕامان و بیرکردنەوە زۆرەو لەکۆتایی ئەم کتێبەدا دێتە گوتن. بەڵام ئەوەی بۆ هەموو رۆژ گرینگە، ئەوەیە کە بیر لە مردن و ژیانی پاش مردن کاتەوەو بە خۆی بڵێ: «پتر لە رۆژێ تا مردنم نەماوە»، قازانجی ئەم بیرە گەلێک زۆرە؛ چونکە هۆی ئەوەی کە خەڵکی روویان لەدونیا ناوە، درێژی ئاواتەکانیانەو ئەگەر بەدڵنیایی بزانن کە تا یەک مانگ یا خۆ ساڵێتر دەمرن، لەوەی کە هەنووکە خۆیان پەرژاندۆتە سەری دووری دەگرن. شایەتا تا یەک رۆژیتر بمرن، لە کاتێکدا ئەمان خەریکی کارێکن کە تا دەساڵیتر نەگاتە ئەنجام.

بۆیە خوداش فەرمووی: «أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ.[6]

کە دڵی پاکژ و بێخەوش کردەوەو ئەم بیرەی بە دڵدا تێپەڕی، مەیلی بۆ دابینی توێشووی دوارۆژ دەبزوێتەوە. دەبێ گەلێک رامێنێ تا لەم چەن رۆژەدا، خێروودمێ بۆ خۆی دەست بخا و لەوی گوناح

---

١ - قورئان، ٢٨٥/٢.

٢ - قورئان، ١٨/٣.

٣ - قورئان، ٢٦/٣.

٤ - سوورەکانی ١١٣ و ١١٤.

٥ - خوایا خۆم و دایک و بابم ببوورەو دەگەڵیان دلۆڤان بە. دەگەڵ من و ئەوان، لە ئێستاو داهاتوودا، لەدین و دونیاو دوارۆژدا، وا بجووڵەوە کە شیاوی خۆتەو دەگەڵمان وا مەجووڵێوە کە شیاوی خۆمانە؛ بە راستی تۆ دلۆڤان و لێ بووری.

٦ - (قورئان؛ ١٨٥/٧) ئاخۆ ئەوان لەدام و دەزگای پڕ شکۆی عاسمانەکان و زەمین و هەرچی خوا دروستی کردوون، رانەماون؟ وێش دەچێ بەم نزیکانە بە ئاکامی مەرگ بگەن. (هـ).

و تاوانە خۆ ببوێرێ و لەرابردوو ئەگەر تووشی گوناح بووە، دەبی قەرەبووی کاتەوە. هەموو ئەمانەش پێویستیان بە رامان و بیر کردنەوەیە.

ئەگەر کەسێک بۆی بلوێ سەیری ئاسمان و زەوی کاو بیر لە سەیرو سەمەرەکانی کاتەوە، هەروەها سەیری شان‌وشکۆی پەروەرندەی جیهان کا، ئەم بیرە هێژاترو بەودمترە لە هەموو تێرامان و بیری خوارتر لەمە، چونکە گەورەیی و بەرزی پەروەردگار بەمە پتر بەسەر دڵدا کاریگەر دەبێ و سەر نەوی دەکا. تا گەورەیی بەدڵ فام نەکرێ، خۆشەویستی نایەتەدی و بەختەوەری پێک نایە. ئەوپەڕی بەختەوەری لە سۆنگەی زۆرترین خوش‌ویستنەوە دێتە دی، ئەمەش بۆ هەموو کەس بووز ناخوا؛ بەڵام بەجێی ئەوە دەتوانێ بیر لەو چاکەی پەروەردگار لە گەڵی کردووە، کاتەوە، یا خۆ بیر لەو نەهامەتیانەی کە لە عالەم دان بکاتەوە -وەکوو نەخۆشی و هەژاری و گوناح و تاوان کە لێی پارێزراوە- تا تێبگا کە شوکرانەبژێری لە سەری پێویستە. شوکرانەبژێری ئەوەیە کە فەرمانەکانی پەروەردگار بەجێ بێنێ و لە سووچ و گوناح خۆی ببوێرێ. بە گشتی ماوەیەک بەم چەشنە لەم بابەتانە رامێنێ، چونکە پاش بەیانی بێجگە لە فەرزو سوننەتی نوێژی بەیانی، تا هەتاو هەڵدێ نوێژی-تر نییە؛ ئەم زیکرو یاد و تێرامانە بەجێی نوێژن.

**ویردی دووهەم**- لەهەڵاتنی رۆژەوە تاکوو چاشتەنگاو. ئەگەر پێ بکرێ چاتر وایە لەمزگەفتدا بمێنێتەوە و تا رۆژهەڵدێ -بە قەدەر رمبێ لە ئاسمان بێتە سەر- بەردەوام خەریکی تەلیلەو زیکر و بیر و ویر بێ تا کاتی ناحەز بوونی نوێژ تێپەڕێ. ئینجا دوو رەکات نوێژ بخوێنێ. کاتی چێشتەنگاو کە هەتاو بەرز بوو -چوار یەکی رۆژ تێپەڕی- خوێندنی نوێژی چاشت چاترە: چوار رەکات نوێژ بخوێنێ؛ شەش یا هەشت رەکات نوێژ بێژراوە کە بخوێنرێ. کە هەتاو بەرز بوو و کاتی چاشتەنگاو تێپەڕی، بپەرژێتە سەرکاری خەڵکی، وەکوو سەردانی نەخۆش، هاوڕایی بۆ ئەسپەردەی مردوو و کردنەوەی گرێ‌وگۆلی ژینی موسوڵمانان یان بەشداری لە کۆڕی خەڵکدا.

**ویردی سێهەم**- لە چیشتەنگاو تا نوێژی نیوەڕۆیە. ئەمە بۆ هەرکەس جیاوازە و چوار دۆخی هەیە:

**دۆخی یەکەم** - بۆ کەسێک کە بۆی بووز بخوا دەرس بخوێنێ. هیچ عیبادەتێ لەمە سەرتر نییە؛ تەنانەت ئەگەر کەسێک بوی لوا، پاش فەرزی بەیانی، چاتر وایە بپەرژێتە سەر زانست فێر بوون، بەڵام زانستێ لە خێری دوارۆژی بداتێ، ئەوەش زانستێکە کە مەیلی دونیا کەمتر کاو حەز بە دوارۆژ پتر کا و نوقسانی و زیانی کردەوەکان خویان کاو بەرەو پاک و پاراوی رێنوێنی کا. بەڵام زانستی «جَدَل» و «خِلاف» و چیرۆک و «تذکیر»، تەمای دونیا فرە دەکەن و تووی رژدی و چاوچنۆکی دەپژێننە دڵ.

ئەو زانستەی کە بە قازانجە، لە کتێبی «احیا» و «جواهرالقران» و لەم کتێبەدا راڤە کراوە: دەبێ بەر لە زانستەکانی‌تر، ئەم زانستە فێر بن.

**دۆخی دووهەم** – ئەوەی خوستی فێر بوونی زانستی نییە، کەچی بۆی دەلوێ خەریکی یادو پەرستنی پەروەردگار بێ.

ئەمە ئاستی خواپەرستانەو پاگەیەکی هێژایە؛ بە تایبەت ئەگەر خەریکی زیکرێ بێ کە لەدڵدا سەقامی گرتبێ و هۆی ئارام و ئۆقرەی دڵ بێ.

**دۆخی سێهەم**. ئەوەیە کە خەریک بێ بە کارێکەوە کە ببێتە هۆی ئاسوودەگی خەڵکی؛ وەکوو پەرای سۆفی و مەلاو دەروێشان. ئەمە هێژاتر لە نوێژە سوننەتەکانە، چونکوو ئەمە هەم عیبادەتەو هەم تەقالا بۆ ئاسوودەگی موسوڵمانان، هەم یاریدەیان بۆ عیبادەت؛ ودم و خێری نزای بەخێری ئەمانە زۆر کاریگەرە.

**دۆخی چوارەم**. ئەوەیە کە هیچ یەک لەمانەی پێ نەکرێ و خەریکی بەدەست هێنانی بژیو بێ بۆ خۆی و خێزانی. کە لە کاردا ئەمانەتی راگرت، خەڵک لەدەست و زمانی ئاسوودە بوون و پاپای بەدەست هێنانی سامانی[٩] زۆرتر، گیانی دانەگرت و چاوی لە دونیا تێر بوو، ئەوەش لە ریزی خواپەرستانە، بەڵام لەپاگەی دووهەمی یارانی لای راستە (اصحاب الیمین). هەرچەند ناڕواتە ریزی پێشڕەوان و نزیکانی دەرگانەی خوا. ئاستی بێوەی‌بوون لەدونیا، کەمترین ئاستە.

بەڵام ئەوەی رۆژگار بە یەکێک لەم چوار کارە نەبوێرێ، لەریزی رەنج خەساران و یارانی شەیتانە.

**ویردی چوارەم**– لە نیوەڕۆوە تاکوو ئێوارە. دەبێ بەر لە نوێژ سەرخەوێ بشکێنێ، چونکە چۆرتی بەر لە نوێژی عەسر وەکی پارشێوە بۆ رۆژوو. ئەگەر هەستان بۆ شەونخوونی نەبێ، ونەوزدان رەوانییە؛ چونکە زۆر خەوتن دزێوە. کە لەخەو هەستا، بەر لە نوێژ تارەت بگرێ و هان بدا کە بانگی نوێژ لە مزگەفتڕا ببیسێ و نوێژی مزگت بخوێنێ و وەرامی بانگبێژ بداتەوەو بەر لە فەرز، چوار رەکات نوێژی سوننەت بە جێ بێنێ. پێغەمبەر ئەم چوار رەکاتەی درێژە پێ دەدا و دەیفەرموو: «لەم کاتەدا دەرگاکانی ئاسمان دەکەنەوە». لە خەبەریشدا هاتووە کە: «هەرکەس ئەم چوار رەکاتی نوێژە بە جێ بێنێ، حەفتا هەزار فریشتە دەگەڵی نوێژ دەکەن و تا شەو داوای لێ بووردنی بۆ دەخوازن». پاشان دەگەڵ ئیمام، فەرزەکەی بە جێ بێنێ و دوای ئەوە دوو رەکات نوێژی سوننەت بخوێنێ و پاش ئەوە تا نوێژی شێوان بپەرژێتە سەر فێربوونی زانست یا یاریدەی موسوڵمانێ، یا خۆ خەریکی زیکر و قورئان خوێندن بێ، یان خەریکی بەدەست هێنانی بژیوی حەڵاڵ بێ.

**ویردی پێنجەم** – لە نوێژی عەسرەوە تاکوو ئاوا بوونی خۆر. دەبێ پێش نوێژی عەسر بێتە مزگەوت و چوار رەکات نوێژی سوننەت بە جێ بێنێ؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «خوا خێرو ودمی زۆر بدا بەو

کەسەی بەر لە نوێژی عەسر، چوار ڕەکات نوێژ دەکا». کەدوایی هێنا، بێجگە لەوەی پێشتر بێژرا خەریکی هیچ نەبێ.

بەر لە نوێژی شێوان بڕواتە مزگەفت و خەریکی تەلیلەو یادی خوداو لێبووردن بێ؛ چونکە خێرو ودمی ئەم کاتە وەکوو هێژایی بەیانییە. بۆیە فەرمووی: وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ[1]. لەم کاتەدا دەبێ ئەم سوورەتانە بخوێنێ:والشَّمْسِ وَ ضُحيها[2]، وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ[3] و «المعوذتين»[4]. دەبێ کاتی ئاوا بوونی ڕۆژ، داوای لێبووردن لە پەروەردگار کات. بە گشتی دەبێ کارەکان دابەش بکرێن و هەرکاتێ بۆ کارێکی تایبەت تەرخان بکرێ؛ چونکە خێرو بەرەکەتی تەمەن بەمەوە پێک دێ. ئەوەی کاتەکانی بە خۆڕایی و سووکی ببوێرێ و بە تەما بێ کە لە هەر کاتدا چ بێتە ئاراوە، تەمەنی فەوتاوەو ڕەنج بەخەسارە.

**ویردی شەوانە کە ئەویش سێیە:**

**یەکەم،** لە نوێژی شێوان تاکوو خەوتن. بە خەبەر بوون لەم مەودایەدا گەلێک بە خێرو بێرە. لە خەبەردا هاتووە کە: تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ[5]، لەم سۆنگەوە هاتووە. دەبێ خەریکی نوێژ خوێندن بێ تا فەرزی نوێژی خەوتن بە جێ دێنێ. زانایان ئەمەیان پێ چاتر لەوەیە کە بە ڕۆژ ڕۆژوو بێ و لەم ساتەدا خەریکی خواردن بێ. کە لەنوێژی تەک ڕەکات (وتر) بووەوە نابێ خەریکی کاری پڕ و پووچ بێ؛ چونکە ئەنجامی ئەو کارانە نابێ بێجگە بە کاری خێر بێ.

**دووەم،** نووستنە. هەرچەن نووستن بە پەرستن و عیبادەت نایەتە ئەژمار، بەلام ئەگەر بە داب و سوننەت بڕازێتەوە، عیبادەتە. سوننەتی خەوتن ئەوەیە کە ڕوو لە قیبلە و لەسەرشانی ڕاست بنوێ (هەوەڵ جار)، وەکوو چۆن مردوو دەنێنە نێو گۆڕ. هەروەها بزانێ خەو، برادەری مردنەو بەخەبەر بوون وەکوو ڕۆژی حەشرە؛ شایەتا ئەوگیانە کە دەخەودا گیراوە، نەدرێتەوە: بۆیە دەبێ توێشووی دواڕۆژی تەیار کردبێ. دەبێ بە تارەتەوە بنوێ و بڕیار بدا کە ئەگەر لە خەو ڕابوو، جارێکیتر گوناح

---

١ - قورئان (٥٠/٣٩) هەر پەسنی پاکی پەروەرندەی خۆت بدە؛ لە پێش گزنگی هەتاودا بەر لە دەمی ڕۆژاوا بوون. (هـ).

٢ - سووره ٩١.

٣ - سوورەی ٩٢.

٤ سوورەکانی ناس و فلق.

٥ - قورئان (٣٢/١٦) بڕکیان لە پێخەفەکانیان جارز دەبێ و بە ترس و بە هومێدەوە هانا وەبەر پەروەرندەی خۆ دەبەن.(هـ)

نەکا. قەوینتی نووسراو لە ژێر سەرین نیێ؛ بەزۆر خۆی نەکاتە خەو. نابێ پێخەفی نەرم و نیان راخا، تا خەو بە سەریدا زاڵ نەبێ؛ چونکوو خەو بە خۆڕایی بواردنی تەمەنە. دەبێ شەو و رۆژ پتر لە هەشت کاتژمێران نەنوێ، ئەمەش دەبێتە سێ‌یەکی بیست و چوار کاتژمێر. ئەگەر وابنوێ، لە شەست ساڵ تەمەندا، بیست ساڵی دەخەودا بووە، واتە بیستی لە شەست فەوتاندووە.

دەبێ بەخۆی ئاو و مسواکی ئامادە کردبێ، تا کاتێ بۆ نوێژی بەیانی هەستا، دەسنوێژ بشوا. دەبێ کاتی نووستن نییەتی هەستان لە نیوەشەو یاخۆ بەرەبەیان بێنێ؛ کە ئەم نییەتەی هێنا، خێری پێ دەگا، هەرچەند خەونی بەسەردازاڵ بێ و بەخەبەر نەبێتەوە.

کە لای داهێشت، دەبێ بڵێ: «رَبِّ بِاسْمِکَ وَضَعْتُ جَنْبِی وَبِاسْمِکَ اَرْفَعَهُ»، ئەو نزایانە پێشتر بێژراون فێریان بێ. ئایەتوولکورسی و «ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ» و سوورەی «تَبَٰرَكَ»[1] و «معوذتین» بخوێنێ، تا خەونی لێ دەکەوێ.

**ویردی سێهەم**: نوێژی شەو پاش لە خەورابوون لەنیوەی دووهەمی شەودا؛ دوو رکاتی نوێژ لە نیوەی دووهەمی شەو، هێژاترە لە چەندین رکات لەکاتی‌تردا. چونکە لەم ساتەدا دڵ بێ‌خەوشترەو کێشەی دونیا کەمتر و دەرگەکانی رەحمەت و خێری ئاسمان ئاوەلاترن.

خەبەر لەمەڕ رابوون لە شەودا گەلێکەو لە کتێبی «احیا»دا بێژراوە. بە گشتی دەبێ کاتەکانی شەو و رۆژ، هەریەکەو بۆ کارێک تەرخان کا و هیچی بەتاڵ نەهێڵێ. کە شەو و رۆژێ وایکرد، دەبێ هەموو تەمەنی بەو چەشنە رابوێرێ. ئەگەر لەبەری دژوار بوو، تەمای دوور و درێژ نەکا و بە خۆی بڵێ: «ئەمرۆ وادەکەم، رەنگە ئەمشەو بمرم؛ ئەمشەو وادەکەم، شایەتا سبەینێ لە خەو رانەبم»؛ هەر رۆژ بەم چەشنە.

کە زۆری ئازاری بینی لە بەردەوام بوون بەسەر ئەم کارە، پێی وابێ لە سەفەرایەو زێدی وی، ماڵی دوارۆژەو لە سەفەردا گەلێک ئازاری نامۆیی دەبێ بچێژێ؛ بەلام سوکنایی بەوە بێتەو کە بڵێ ئەم دووروڵاتییە رادەبوورێ و لە زێدی خۆمدا دەحەسێمەوە. تەمەنی دونیاش بە رێژی تەمەنی هەتا هەتایی، ئاشکرایە چەن کورت و کەمە. ئەگەر کەسێک رەنجی دە ساڵان بکێشێ بۆ سەدساڵ حەسانەوە، هیچ سەیر نییە و ئەگەر سەد ساڵ ئازار بداتە خۆ بۆ حەسانەوەی هەتاهەتایی، چ جای سەرسووڕمانە.

---

[1] - قورئان ٦٧ – سوورەتی «الملک»

## کتێبی دووهەم - لە کردەکاندا(معاملات)

---

لەم پاژەدا دە بنەما هەیە:

بنەمای یەکەم - نەریتەکانی خۆراک خواردن

بنەمای دووەم - نەریتەکانی پێوەندی ژن و مێرد

بنەمای سێهەم - نەریتەکانی کاروکەسب و مامەڵە

بنەمای چوارەم – بەدەست هێنانی بژیوی حەلاڵ

بنەمای پێنجەم: نەریتەکانی ئاخافتن دەگەڵ خەڵکی

بنەمای شەشەم - نەریتەکانی دوورەپەرێزی

بنەمای حەوتم - نەریتەکانی سەفەر

بنەمای هەشتەم - نەریتەکانی هەلەکەو جەزمە

بنەمای نۆهەم – فرمان بە چاکە

بنەمای دەیەم - فرمانڕەوایی کردن

## بنه مای یه که م - نه ریته کانی خۆراک خواردن

بزانە، ڕێگای عیبادەتیش، هەمان عیبادەتە و توێشووی ڕێگاش هەمان ڕێگایە. کەواتە، هەرچی پێویستی ڕێگای دین بێ، هەمان دینە. ڕێگەی دین پێویستی بە خواردنە: مەبەستی هەموو ڕێبوارانی ڕێگەی خوا، دیداری پەروەردگارە و تووی ئەو دیدارە، زانین و کردەوەیە. چاودێری و بەردەوامی لە سەر زانین و کردەوە، بەبێ تەندروستی بووز ناخواو تەندروستیش بێ خواردن وخواردنەوە پێک نایێ؛ خواردن پێویستی ڕێگای دینە، بۆیە پاژێک لە دینە. بەم بۆنەوە پەروەردگار فەرمووی: يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًا[1]؛ خواردن وکاری چاکەی پێکرا کۆوە کرد.

کەواتە، هەرکەس خۆراک بخوا تا خوستی زانین وکاری چاکەی لێ نەبڕێ ولە سەر ڕێگا بڕینی ڕێی پەسلان بەردەوام بێ، ئەو خواردنەی عیبادەتە؛ هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «مرۆڤی بڕوادار هەموو کەردەوەیەکی پاداشی هەیە، تەنانەت پارووە نانێک کە لە سەر زاری خۆی وخێزانی دەینێ». مەبەستی ئەوە بوو کە دۆزی[2] بڕوادار لە هەموو کردەوەیەکی، ڕێی دوارۆژە.

نیشانەی ئەوەی کە ئەو خواردنە بۆ ڕێی دینە ، ئەوەیە کە بە هەڵپە و لەزو بەز نەخوا و لە حەلاڵ نەبێ نەخوا و پتر لە نیازی نەخوا و داب و نەریتی خواردنیش بەجێ بێنێ.

خواردن داب ونەریتێکی هەیە: هەندێکی بەرلە خواردن، بڕێکی پاش خواردن و هەندێکیشی لە کاتی خواردندا.

### داب و دەستوری بەر لە خواردن

ئەوەی بەر لە خواردنە:

**یەکەم**- دەبێ دەست و دەمی بشوا؛ چونکە گەر خواردن بە مەبەستی توێشووی دوارۆژ بێ، عیبادەتە ودەست ودەم شۆردن وەکوو دەستنوێژە بەر لە نوێژ خوێندن، هەروەها دەست و دەمیش

---

١- (قورئان، ٢٣ /٥١) لە شتی پاک وپاراو بخۆن وچاکە بکەن.

٢- دۆز: ئامانج.

پاکژتر دەبێ. لە خەبەردا هاتووە کە: «هەرکەس بەر لە خواردن دەستی بشوا، لە هەژاری دوور دەبێتەوە».

**دووم**- خواردن لە سەر سفرە دانێ نەک لە سەر تەبەق. چونکە پێغەمبەر وای کردووە. سفرە، سەفەر دەخاتەوە بیر و سەفەری دونیا، سەفەری دوارۆژ دێنێتەوە یاد؛ هەروەها لە خۆبەکەمگریش نزیکترە. هەرچەن گەر لە سەر خوان و تەبەق خواردن دانێ، رەوایە و هیچ لەم کارە نەهی نەکراوە، بەلام دام ودەستووری پێشوونان وا بووە و پێغەمبەریش وای کردووە؛ واتە لە سەر سفرە نانی داناوە.

**سێیەم**- جوان دانیشێ: چۆکی راستی کۆوە کا و لە سەر پای چەپی دانیشێ و لە کاتی خواردندا پاڵ نەداتەوە؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی:«من بە پاڵەوە نان ناخۆم، چونکە من بەندەم، وەکوو بەندە رۆدەنیشم و وەکوو بەندە نان دەخۆم».

**چوارم**- مەبەست لە خواردن هێز بۆ عیبادەت بێ، نەک بۆ شاوەت. ئیبراهیمی شەیبان دەیگوت: «هەشتا ساڵە هیچم لە بە بۆنەی شاوەتەوە نەخواردووە». نیشانەی راستی ئەم مەبەستە ئەوەیە کە کەم بخوا، چونکە زۆرخواردن دەبێتە بەربەستی عیبادەت، پێغەمبەر فەرمووی: «چەن پاروویەک کە پشتی مرۆڤ راست بگرێ ، بەستە». گەر بەم رادەیە قنیات نەکا، سێیەکی ورگی دەبێ خۆراک بخوا، سێیەکی ئاو و سێیەکی بۆ هەناسە.

**پێنجەم**- تا برسی نەبێ دەس بۆ خۆراک رانەکێشێ. باشترین نەریتێک کە بۆ خواردن دەبێ رابگیرێ ، برسیەتییە؛ چونکە خواردن بەر لە برسیەتی دزێو و مەکرووهە. هەرکەس کاتێ برسی بوو دەس بۆ خۆراک راکێشێ و بەر لە تێربوون دەست راگرێ، قەد نەخۆش ناکەوێ و پێویستی بە پزیشک نابێ.

**شەشم**- هەرچی بۆی دانرا و هەرچی ئامادە بوو، پێی رەزا بێ و داوای خواردنی خۆش و رەنگاورەنگ نەکا؛ چونکە مەبەستی بڕوادار لە خواردن راگرتنی هێزی عیبادەتە، نەک سک لەوەڕاندن. دەستوور ئەوەیە کە نان بەڕێز بگیرێ وکاتێ نان دانرا، چاوەڕوانی پێخۆر نەکەن، تەنانەت زۆرترین رێزگرتن لە نان ئەوەیە کە چاوەڕوانی نوێژی نەهێڵن و کاتێ سفرە راخرا، سەرەتا نان بخورێ، پاشان نوێژ بخوێنرێ.

**حەوتم**- بە تەنیایی و بێهەواڵ سفرە رانەخا و دەست بۆ نان درێژ نەکا؛ چونکە تەنیا خواردن جوان نییە، هەرچەن دەستی زۆرتر لە سەر سفرەدا بێ، خێرو ودمی زۆرترە. ئەنەس دەڵێ:«پێغەمبەر چجار تەنیا نانی نەخوارد».

### داب ودەستووری کاتی خواردن

نەریتی کاتی خواردن ئەوەیە کە سەرەتا «بِسْمِ اللهِ» بڵێ و لە دواییدا «الحمدلله». چاکتر وایە لە یەکەم پاروودا بڵێ «بِسْمِ اللهِ»، لە پارووی دوومدا بڵێ «بِسْمِ اللهِ الرَّحمن»، لە پارووی سێیەمدا بڵێ

«بسم‌الله‌الرحمن‌الرحیم». هەروەها باشتر وایە بە دەنگی بەرز بیلێ، تا کەسانی‌تریش بێتەوە یادیان.

بەدەستی ڕاست بخوا و سەرەتا بە خوێوە دەست پێ بکا وکۆتایشی بە خوێ بێ: چونکە لە خەبەردا هاتووە کە «با شاوەتی خواردن بشکێ بەوەی کە بە ئاوەژووی ئارەزووی نەفس پاروو هەڵبگرێ». پارووی بچووک بگرێ و جوان بیجاوێ و تا قووتی نەدا، دەست بۆ پاروویەکی‌تر نەبا.

هیچ خواردنێ بە خراپ نەزانێ: چونکە پێغەمبەر قەد وای نەکرد. گەر پێی‌خۆش بوو بخوا و گەریش پێی خۆش نەبوو دەست ڕابگرێ. لەبەر خۆیەوە بخوا، مەگین میوە کە گەر لە تەنیشت تەبەقەکەوە بخوا چاترە، چونکە ئەوە جیاوازە. لە ناوڕاستی دەفرەوە تریت نەخوا، بەڵکوو لە تەنشتەکانیەوە بخوا. نانیش لە ناوەڕاستەوە نەخوا، بەڵکوو لە سووچێکە لێی بخوا. نان بە چەقۆ لەت نەکا، گۆشتیش هەروا. گەر پاروویەکی لە دەست داکەوت، هەڵیبگرێ، پاکژی کاتەوە و بیخوا: چونکە لە خەبەردا هاتووە کە گەر وازی لێ بێنێ، بۆ شەیتانی هێشتۆتەوە.

سەرەتا قامکی بەدەم بلێسێتەوە، پاشان بە فۆتەیەک پاکژی کاتەوە. تا ئاسەواری خواردنەکەی پێوە نەمێنێ؛ چونکە بۆی هەیە بەرەکەت، هەر لەوەدا بێ. فوو لە خۆراکی داخ نەکا، بەڵکوو ڕاوەستێ تا بۆ خۆی سارد بێتەوە.

کە خورما یان قەیسی یا هەر میوەیەکی‌تر کە بژمێردرێی خوارد، با تاق بێ (حەوت، یازدە یا بیست و یەک) ؛ تا سەرجەمی کارەکانی پێوەندی بە پەروەردگارەوە بێ، چونکە خوا تاقە و جووت نییە. هەر کار کە بە چەشنێ یادی پەروەدگاری لە گەڵ نەبێ، ئەو کارە بێ‌بەهرە و کەڵک و پووچەڵە؛ کەواتە تاک لە جووت هێژاترە. ناوکەی خورما لە گەڵ خورماکە نەهاوێژێتە نێو تەبەقەوە یا خۆ لە نێو لەپی ڕاینەگرێ؛ هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە تلفەیان هەیە. لە نێوان خۆراک خواردندا ئاوی زۆر نەخواتەوە.

## داب و دەستووری ئاو خواردنەوە

نەریتی ئاو خواردنەوە ئەوەیە کە گۆزەکەی بە دەستی ڕاست بگرێ و بلێ:«بِسْمِ الله» هێور و بەردەوام بیخواتەوە. بە ڕاوەستاوی و بە ڕاکشاوی نەخواتەوە. سەرەتا سەیری نێو گۆزەکەی کا نەکوا پووش یان گیاندارێکی تێکەوتبێ. گەر قورپێنەی دا، دەم لە سەرگۆزەکە لابا. گەر بە زۆرتر لە جارێک دەیخواتەوە، با بە سێ جار بیخوا و هەر جارەش«بِسْمِ الله» بلێ. دەست لە ژێر گۆزەکەوە ڕابگرێ تا ئاو بە سەر شتێکدا نەتکێ. کە خواردنەوەکەی دوایی هات بلێ: «اَلْحَمْدُ لله اَلَّذی جَعَلَهُ عَذباً فُراتاً بِرَحْمَته وَ لَمْ یَجْعَلْهُ مِلْحَاً اُجاجاً بِذُنُوبِنا»[1].

---

١ - سپاس بۆ خودایەک کە بە بەزەیی خۆی ئەوەی شیرین و گەوارا کرد و بە هۆی گوناحەکانمان بۆمانی تفت وتاڵ نەکرد.

## دام ودەستووری پاش خواردن

نەریتی پاش خواردن ئەوەیە کە بەر لە تێری دەس ڕابگرێ و قامکەکانی بەدەم و پاشان بە دەسڕۆکی سەر سفرە پاکژ کاتەوە و ڕێزۆڵەکان کۆوە کا؛ چونکە لە خەبەردا هاتووە کە هەرکەس وایکرد، دەرگای خۆشی بە سەردا دەکرێتەوە ومندالی تەندروست و بێ خەوش دەبێ و ئەو ڕێزەولانە دەبنە مارەیی حوورییەکانی لە بەهەشتدا.

پاشان بە خیلال دانەکانی خاوێن کاتەوە. هەرچی بەزار لە دانی جوێ بۆوە، بیخوا و هەرچی بە خیلال جیا کراوە، بیتفێنێتەوە. دەفرەکەی بە قامک بسڕێتەوە. لە خەبەردا هاتووە کە هەرکەس دەفرەکەی تەواو بلێسێ، کاسەکەی دەڵێ:«پەروەرێنەر! تۆش ئەو لە ئاور بپارێزە، بەو جۆرەی کە ئەو منی لە دێوان پاراست». هەروەها گەر بیشواو ئاوی تێدا بخواتەوە، وەکوو ئەوەیە کۆیلەیەکی ڕزگار کردبێ.

پاش خواردن بڵێ:«اَلْحَمْدُ لله اَلَّذی اَطْعَمْنَا وَسَقَانَا وكَفانا وَآوانا وَ هُوَ سَیِّدُنا وَ مَولانا[1]؛ قُلْ هُوَاللهُ اَحَد[2] وَ ولِإیلافِ قُرَیْشٍ[3] بخوێنێ.

هەروەها، کە خواردنێکی حەلالی دەست کەوت، سپاسی خوا کات؛ کە شوبهە و لێلی تێدا بوو، بگرییێ و خەم بخوا، چونکە کەسێک کە دەخوا و دەگرییێ، وەکوو کەسێک کە دەخوا و نەزانانە پێدەکەنێ نییە.

کە دەستی دەشوا، سەرەتا کەفکەفۆک بدا لە دەستی چەپی و سەری قامکەکانی دەستی ڕاستی بشوا (بەبێ کەفکەفۆک)، پاشان کەفکەفۆک بدا لە قامکەکانی و ددان و دەم و لێوی پێ بشوا و جوان جوان بیهەنوێ. دەبێ سەرەتا قامکەکانی بشوا، پاشان دەم و لێوی لە کەفکەفۆک خاوێن کاتەوە.

## دام و دەستووری خۆراک خواردن لە گەڵ کەسیتر

ئەو نەریتانەی کە پێشتر بێژران، چ تەنیا بێ و چە لە گەڵ کەسیتر بێ، دەبێ جێبەجێ بکرێن؛ بەلام گەر کەسێکیتری لە گەڵ بوو لە کاتی خواردندا، دەبێ ئەم حەوت نەریتەش جێبەجێ کا:

**یەکەم**- دەست بۆ خۆراک ڕانەکێشێ، تا ئەو کەسەی لەو سەرترە (سەرتری لە تەمەن، زانست یان پارێزکاری) دەست ڕانەکێشێ. گەر ئەم لە هەمووان سەرتر بوو، خەلکی چاوەڕوان نەکا.

**دووەم**- لە کاتی خواردندا بێدەنگ نەبێ -ئەوە نەریتی عەجەمانە- بەلام قسەی جوان و بەتوێکل بڵێ،

---

[1] - سوپاس بۆ خودایەک کە خواردن وخواردنەوەی پێ داین ، بەقەدەر نیازمان پێی داین ولە پەنای خۆیدا ڕایگرتین. هەرئـەو گـەورە و سەرۆکمانە.

[2] - سوورەی١١٢ قورئان

[3] - قورئان سوورەی١٠٦.

لە چیرۆکی پارێزکاران و ژیری و هۆزانییان بلێ و لە قسەی پرو پووچ و بێکەڵک خۆی ببوێرێ.

**سێیەم**- ئاگەدار بێ کە پتر لە هاوکاسەکەی نەخوا -چونکە هاوبەشن، هەرچی فرەتر بخوا حەرامە تەنانەت دەبێ لە خۆی ببوێرێ و زۆرتر و چاکتر بخاتە لای هاوکاسەکەیەوە. گەر برادەرەکەی هێواش دەخوا، داوای لێ بکا کە خێراتر بخوا. پتر لە سێ جار پێی نەڵێ«بخۆ» چونکە ئەوە پێداگری و زێدەڕۆییە. هەروەها سوێندی نەدا بۆ خواردن، چونکە خۆراک سووکتر لەوەیە کە سوێندی بۆ بخۆن.

**چوارەم**- بۆ خۆی وانەخوا کە نیاز بێ دۆستەکەی پێی بڵێ بخۆ، بەلام لە خواردندا هاوڕایی لە گەڵ کا. نابێ کەمتر لە رادەی ئاسایی خۆی بخوا، چونکە ئەوە مەراییە؛ بەلام دەبێ لە تەنیاییدا خۆی فێری دام و دەستوور کا و رابێ و لە نێو کۆڕو کۆمەڵیشدا هەروا بخوا. بەلام گەر بە مەبەستی لەخۆبوردن کەم دەخوا، ئەوە چاکترە؛ هەروەها گەر بۆ هاندانی دۆستانی زۆرتر دەخوا، ئەویش چاک و بەجێیە.

ئیبنولمبارەک هەژارانی بۆ خورما گاس دەکردو دەیگوت:«هەرکەس فرەتر بخوا، بۆ هەر ناوکە خورمایەک کە زۆرتر بێ، درهەمێکی پێ دەدەم». ئەوسا ناوکەکانی دەبژارد تا بزانێ کێ زۆرتری خواردووە. بۆ هەر ناوکەیەک، درهەمێکی پێ دەدان.

**پێنجەم**- دەبێ چاوی داخا وسەیری پارووی کەسانیتر نەکا وگەر دۆستانی شەرمی لێ دەکەن، بەر لەوان دەست رانەگرێ؛ گەر کەمخۆرە با لە سەرەتاوە نەخوا و لە کۆتاییدا بە مەیلەوە بخوا؛ گەریش نەتوانێ، هۆکەی بە دۆستانی بلێ تا شەرمەزاری نەبن.

**شەشەم**-کارێک کە بێزی کەسانیتر هەڵدەستێنی، نەکا: دەست نەخاتە نێو دەفرەکەوە، دەم لە سەر دەفرەکەی رانەگرێ تا شتێ لە دەمی داکەوت، نەکەوێتە نێو دەفرەکەوە؛ کاتێ ویستی شتێ لە دەمی دەربێنێ، روو وەرگێڕێ، پارووی چەور نەکاتە نێو سرکەوە، پاروویەک کە بە دەم پچراندوویە؛ جارێکیکە نەیکاتە نێو دەفرەکەوە؛ خەڵکی لەم کارانە بێزیان دێ. هەروەها باسی شتی پێس و بێزهێنەر نەکا.

**حەوتەم**- ئەوەیە کە گەر دەستی لە نێو تەشتدا شۆرد، لە لای خەڵکە ئاوی دەمی نەکاتە نێو تەشتەکەوە. هەروەها ئەوەی سەرترە، پێشتر تەشتەکە بۆ ئەو رابگرن؛ گەر رێزیان لێ گرت (سەرەتا بۆ ئەویان راگرت) قبوڵی کا. لە لای راستەوە بیگێڕێ. ئاوی هەموو دەستەکان کۆوە کەن و هەر ئاو بە جیا نەڕێژن؛ ئەمە خووی عەجەمانە. گەر هەموویان پێکڕا دەستیان بشۆن، ئەوە چاترو هێژاترە و لەخۆبەکەمگری نێزیکترە. کە ئاوی دەمی تفاندەنێو تەشتەکەوە، بە هێمنی بیتفێنێ، تا پرشەی لە کە-س نەکەوێ و نەکەوێتە سەر رایەخەکەوە. ئەوەش کە ئاو دەرێژێ، چاکتر وایە راوەستاو بێ تا دانشتوو.

سەرلەبەری ئەم نەریتانە لە خەبەردا هاتوون. ئەم دام و دەستوورانەن کە مرۆڤ و ئاژەڵ لێک جیا دەکەنەوە، چونکە ئاژەڵ بە کەیفی خۆیان دەخۆن وچاک و خراپ نازانن و توانی هەڵاواردنیان پێ نەدراوە. کە مرۆڤ ئەم توانەی پێدراوە و بە کاری نەگرت، شوکرانەی نیعمەتی ئاوەز و فامی بەجێ

نەهێناوە و ناسپاسی کردووە.

## هێژایی نان خواردن لە گەڵ دۆستان و برایانی دینی

بزانە، میوانداری دۆستێک بۆ خواردن، لە زۆرێک سەدەقە هێژاتر و چاکترە؛ چونکە لە خەبەردا هاتووە کە، مرۆڤ بۆ سێ شت لێی ناپرسنەوە: ئەوەی بە پارشێو دەیخوا، ئەوەی بە بەربانگ دەیخوا و ئەوەی لە گەڵ دۆستانی دەیخوا.

جەعفەر کوڕی محەمەد دەڵێ: «کاتێ لە گەڵ برادەرانت لە سەر خوان ڕۆنیشتی، پەلەمەکە، تا ماوەیەکی چاک بخایەنێ؛ چونکە ئەو ماوەیە ناخرێتە ریزی تەمەنتەوە».

حەسەنیبەسری دەڵێ: هەرچی مرۆڤ بیکاتە خەرجی خۆی و دایک و بابی، لێی دەپرسنەوە، بێجگە خۆراکێک کە لە پێش دۆستانی رابنێ».

هەندێ لە گەورەکانی پێشوو کاتێ سفرە و خوانیان بۆ میوانان رادەخست، خۆراکی زۆریان دادەنا، چونکە دەیانگوت: «لە خەبەردا هاتووە کە هەرکەس بەرماوی سفرەی دۆستانی بخوا، لە سەری حیساب ناکرێ؛ منیش پێم خۆشە لەوەی کە لە پێشی ئێوە دەمێنێتەوە بخۆم».

عەلی دەیگوت:« پێم خۆشە یەک ساع[1] خۆراک لە پێش برادەرانم دانێم تا ئەوەی کە کۆیلەیەک رزگار کەم».

لە خەبەردا هاتووە کە خودا لە پەسلاندا دەڵێ:«ئەی کوڕی ئادەم! برسی بووم و نانت پێ نەدام». دەڵێن: «خوای مەزن! چۆن برسیت بوو، کەچی تۆ خێوی هەموو عالەمی؟» دەڵێ: «برادەرت برسی بوو، گەر نانت پێی بدایە، نانت بە من دابوو».

پێغەمبەر فەرمووی:«هەرکەس نان و ئاو بداتە برای موسڵمانی تا ئەوەی کە تەواو تێر بێ، پەروەردگار لە ئاوری دۆژەەدووری دەکاتەوە و حەوت خەرەند[2]ی دەکەوێتە نێوانەوە و هەر خەرەند پانسەد ساڵە رێ نێوانیانە». هەروەها گوتێ : «خَیْرُکُم مَنْ اَطْعَمَ الطَّعامُ»؛ چاترینیان ئەوەیە کە نان بدەر بێ.

## دام و دەستووری خۆراک خواردن بۆ ئەو دۆستانەی سەردانی یەک دەکەن

**ئەریتی یەکەم**- ئەوەیە کە بۆ خواردن، سەردانی برادەری نەکا؛ چونکە لە خەبەردا هاتووە کە «ئەوەی بەبێگاس کردن، بۆ خواردن سەردانی کەسێک کا، لە ڕۆییندا خراپکارە و لە خواردندا حەرامخۆرە».

---

١ - ساع : یەکەی کێشانەیە بەرانبەر لە گەڵ ٤ مەن.

٢ -خەرەند= خەندەق.

بەلام گەر بە هەلکەوت بە سفرەی داخراوی کەسێکدا گەیشت، بە بێ ئیزن نابێ بخوا. گەر پێی بلێن بخۆ، بەلام بزانێ نابەدلانە گوتوویانە، دیسان نەخوا -چونکە رەوا نییە- هەرچەند دەتوانێ دەس راکێشێ و بە وردەنانەوە خۆی خەریک کا. گەر کەسێک ویستی بۆ خواردن سەردانی مالی برادەرێکی کا کە متمانەی پێیە و لە دلی ئاگەدارە، رەوایە و دەتوانێ؛ تەنانەت ئەمە لە نێو دۆستاندا سوننەتە.

پێغەمبەرو ئەبووبەکر و عومەر لە کاتی برسیەتیدا، سەردانی مالی ئەبوو ئەیووبێ ئەنساری و ئەبولهەیسەم کوڕی تەیهانیان کردووە و داوای نانیان کردووە. ئەمە چاکەیەکە لە گەل خانەخوێدا، چونکە دەزانن پێی خۆشە.

کەسی وا هەبوو لە گەورەکان کە سێسەدوشەست برادەری بووە و هەر شەوە لە مالی یەکیان بووە؛ کەسی واش بووە کە سی دۆستی بووە و لە مانگدا هەر شەوە لە لای یەکیان بووە؛ کەسیش بووە کە حەوت دۆستی بووە و هەرشەوی حەوتە لە خانووی یەکێکیاندا بووە. ئەم دۆستانە سەرمایەی ئەوکەسانە بوون و ئەوکەسانەش کە میوانداری دۆستانیان دەکرد، هۆی عیبادەتی ئەو پارێزکارانە بوون. تەنانەت گەر دۆستایەتی دونیایی پێک هات، رەوایە گەر لە مالیشدا نەبن، خۆراکی یەک بخۆن؛ کاتێ پێغەمبەر دەڕۆیشتە مالی بورەیرە[1]، گەرمالیش نەبایە، خۆراکی دەخوارد چونکە دەیزانێ پێی شادوشوکر دەبێ. محەمحەد کوڕی واسیع ، لە پارێزکارانی گەورە بوو، لەگەل یارانی ڕۆیشتن بۆ مالی حەسەنی بەسری و هەرچی دەستیان کەوت خواردیان؛ کاتێ حەسەنی بەسری گەڕایەوە زۆری پێ خۆش بوو. تاقمێ ڕۆیشتنە مالی سەفیانی سەوری و ئەوانیش وایان کرد. کە گەڕایەوە گوتی:« ئاکاری پێشوونانتان هێنامەوە یاد، ئەوانیش وایان دەکرد».

**نەریتی دووەم**- ئەوەیە کە گەر دۆستێکی هات بۆ لای، هەرچی ئامادە بوو بیهێنی و خۆی نەخاتە زەحمەت؛ گەر هیچی نەبوو، قەرز نەکا، گەر پتر لە رادەی نیازی بنەمالەی نەبوو، داینێ بۆ خێزانەکەی و هیچ نەهێنێ.

یەکێک میوانداری عەلی کوڕی ئەبوتالیبی کرد، گوتی: «بە سێ مەرج دێم: هیچ لە بازاڕ نەهێنی، هەرچی لە مالدا هەبوو، هەر ئەوە بێنی و بەشی خێزانت بە تەواوی جیا کەیتەوە».

فوزەیلی عەییاز دەلێ:« خەلکی بە بۆنەی خۆخستنە نێو زەحمەتەوە، لێک دابڕاون، گەر ئەوە لە ناودا نەمێنێ، بێ شێلە و بێلە سەردانی یەک دەکەن».

بەلام پرسینی ئەوەی کە «شتێ بێنم یا نە؟» ناحەز و دزێوە. بەلکوو دەبێ ئەوەی هەیە بیهێنن و ئەگەر نەیخوارد بیگێڕنەوە.

---

[1] بورەیرە (بریرە): کارەگەری عایشە کە بە پارە کڕیبووی وئازادی کردبوو.

## خێر و ودمی میوانداری

ئەوەی بێژرا، باس لەوەی بوو کەسێک بەبێپرس و داوەت خۆی بکاتە میوان؛ بەلام حوکمی بانگهێشتن کردن شتێکی‌ترە.

بێژراوە کە گەر میوانێ بێپرس‌ورا هات، خۆماندوو مەکەو گەر داوەتت کرد دەس پێوەمەگرە؛ واتە: تا دەتوانی میوانداری کە.

لە خێروودمی میوانداریدا خەبەری زۆر هاتووە. ئەمە خووی خەلکی عارەبە کە لە سەفەردا سەردانی مەنزلگای یەکتر دەکەن؛ بەرێ‌کردنی ئاوەها میوانێ زۆر گرینگە. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی میواندار نەبێ، خێرێکی تێدا نییە». هەروەها گوتی: «بۆ میوانتان خۆ ماندوو مەکەن تا رقتان لێ نەبێ و بە دوژمنی نەزانن؛ هەرکەس میوانی لێ بێ بە دوژمن، خوای کردووە بە دوژمن؛ ئەوەش کە خودا بکاتە دوژمن، خوداش ئەو دەکاتە دوژمن».

ئەگەر میوانێکی نامۆ لە رێوە بگات، بۆ میوانداری ئەو میوانە رەوایە قەرز بکرێ و خۆ بخرێتە ئازار؛ بەلام بۆ ئەو برادەرانەی بۆ سەردانی یەک دەرۆن رەوا نییە، چونکە دەبێتە هۆی لێک دابران.

ئەبوو رافیع خزمەتکاری پێغەمبەر، دەلێ جارێ پێغەمبەر پێی گوتم: «بە فلان فەلە بلێ ئاردم بە قەرز بداتێ تا مانگی رەجەب، چون میوانم دێ». کابرای فەلە گوتی: «تا بارمەتم پێ نەدا، نایدەم». گەرامەوە و پێم گوت. پێغەمبەر فەرمووی: «سوێند بەخودا کە من لە ئاسمان و زەویدا باوەڕ پێکراوم، ئەگەر پێی بدایام، پێم دەدایەوە. هەنووکە ئەو زرێیەم بە بارمتەم بۆی ببە». بردم و بارمتەم پێیدا.

ئیبراهیم بۆ دینەوەی میوان یەک دوو میل دەرۆیشت و تا میوانی نەدیبایەوە نانی نەدەخوارد. لە سۆنگەی ئەم راستیەوەیە کە ئێستا میوانخانەیەک لە شارەکەیدا ئاوەلایە و هیچ شەو لە میوان بێ بەش نییە و شەو هەیە، سەد و دووسەد میوانی لێیە و چەن گوندیان وەقفی ئەو میوانخانەیە کردووە.

## نەریتەکانی بانگهێشتن و رۆیشتن بۆ داوەت

سوننەت ئەوەیە کە بۆ بانگ کردن، تەنیا چاکان دەنگ بکرێن؛ چونکە خواردن، هێزدانە و بۆ خراپکاران ئاریکارییە بۆ خراپەکردن. هەروەها دەبێ هەژاران دەنگ کا نەک دەولەمەندان، چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «خراپترین خواردن، خواردنی سوورێکە کە بانگی دەولەمەندان کرابێ و هیچ هەژارێ دەنگ نەکرابێ». نابێ خزمان و دۆستانی نزیک لە بیر بکرێن، چونکە لە بیر کردنیان دەبێتە هۆی دابران و دووری. نابێ مەبەست لە داوەت خۆهەلکێشان و دەماربەرزی بێ، بەلام دەبێ بیری بە لای بەجێهێنانی سوننەت و ئاسوودەگی هەژارانەوە بێ. بۆ هەرکەس کە بزانێ هاتن بۆ میوانی پێی گرانە، بانگی نەکا؛ چونکە دەبێتە هۆی ئازاری ئەو کەسە. هەرکەس زۆر پێی خۆش نەبێ بە دەنگیەوە

بڕوا، بانگی نەکا؛ چونکە گەر بڕوا، بە نۆبە دڵی خۆراکی دەخوا و ئەمەش گوناحە.

**بەلام نەریتی چوون بۆ داوەت** - دەبێ لە نێوان داوەتی نەدار و دارا جیایی دانەنێ و لە داوەتی هەژار خۆی لانەدا؛ چونکە پێغەمبەر دەڕۆیشت بۆ میوانی هەژاران. حەسەنی کوڕی عەلی ڕۆژێ بەسەر تاقمێ لە هەژاراندا تێپەڕی: چەن لەتە نانێکیان لە پێش دانابوو و دەیانخوارد. گوێتان: «ئەی کوڕی پێغەمبەر! لەگەڵمان بە». لە چوار پێیەکەی هاتە خوارو بوو بە میوانیان و گوتی: «پەروەردگاری هێژام لووت بەرزانی خۆش ناوێ». کە نانی خوارد گوتی: «ئێستا ئێوەش بەیانی ببنە میوانی من». ڕۆژی دوایی خواردنی خۆشی بۆیان لێ ناو پێکەوە خواردیان.

**دووەم** - ئەگەر تێگەیشت خانەخوێ سەرکۆنەی ئەم خواردنەی دەکاو لەم سۆنگەوە خۆی هەڵدەکێشێ، چاتر وایە نەڕوا بۆ میوانیەکەی؛ دەبێ خانەخوێ هاتنی میوانەکەی بە چاکەو گەورەییەک بزانێ کە میوان دەگەڵی کردووە. ئەگەر تێگەیشت کە لە ماڵوسامانی خانەخوێدا لێڵییەک هەیە، یاخۆ شتێکی نەهی لێکراوی وەکوو ڕایەخی ئاوریشمی و تەبەقی زێڕین، یان بەسەر دیواردا وێنەی ئاژەڵانە، یاخۆ ئەگەر کۆڕی بەزم و هەڵپەڕکێ و گۆرانییە، یاخۆ کەسێک دەکەنە گەپجاڕ و جنێوی پێدەدەن، یان ئافرەتی جوان و بەدەو بۆ سەیری پیاوان دێنن، نەڕوا بە دەنگییانەوە؛ ئەمانە هەموو ناحەزن و ڕۆیشتن بۆ ئاوەها شوێنێک ڕەوانییە.

هەروەها ئەگەر خانەخوێ شتی نوێ لە دیندا دادێنێ، یان داوێن‌پیسە و یاخۆ زۆربێژە، چوون بۆ میوانیەکەی ڕەوانییە. ئەگەر ڕۆیشت و شتێکی نالەباری بینی و پێی نەکرا بەری پێ بگرێ، هاتنە دەرەوە لە سەری پێویستە.

**سێهەم** - بە هۆی دووری ڕێوە خۆی لە ڕۆیشتن لانەدا؛ بەڵکوو دەبێ ئەگەر پێی دەکرێ، بڕوا. لە تەوراتدا هاتووە کە: «یەک میل بڕۆ بۆ سەردانی نەخۆش؛ دوو میل بڕو بۆ ئەسپەردەی تەرم؛ سێ میل بڕۆ بەدەنگ میوانیەوە؛ چوار میل بڕۆ بۆ سەردانی هەڤاڵی دینی».

**چوارەم** - بە هۆی ڕۆژووەوە نابێ نەڕوا، بەلام کە ڕۆیشت و خانەخوێ لێی زیز نەبوو، بە بیستنی بۆنی خۆش و گفتی جوان قنیات کا؛ چونکە میوانداری لە ڕۆژوودار هەروایە. ئەگەر دەزانێ لێی زیز دەبێ، ڕۆژووەکەی بکاتەوە؛ چونکە پاداشی شادکردنی دڵی موسوڵمانێ هێژاتر و بەنرختر لە ڕۆژووە. پێغەمبەر لۆمەی ئەو کەسەی کردووە کە بە بیانووی ڕۆژووەوە بۆ بانگهێشتن نارِوا و فەرموویە: «هەڤاڵت خۆی بۆ تۆ ماندوو دەکاو تۆ دەڵێی بەرۆژووم؟»

**پێنجەم** - بە مەبەستی خواردن و ورگ لەوەڕاندن نەڕوا بۆ میوانی، چونکە ئەمە کاری ئاژەڵانە؛ دەبێ بە نییەتی پێڕەوی لە سوننەتی پێغەمبەر بڕوا و دوور بگرێ لەوەی پێغەمبەر فەرموویە: «ئەوەی بە

دەنگی بانگهێشتنەوە نەڕوا، لە فرمانی خودا و پێغەمبەر لای داوە». بۆیە هەندێ گوتوویانە «ڕۆیشتن بۆ داوەت فەرز و پێویستە». بەو مەبەستەوە بڕوا کە ڕێز لە برای موسولمانی بگرێ، چونکە لە خەبەردا وا هاتووە کە «ئەوەی ڕێز لە بڕواداری بگرێ، خوای دلۆڤانی ڕێز لێناوە». هەروەها دەبێ نیازی شادکردنی دڵی خانەخوێی بێ، لە خەبەردا هاتووە کە «هەرکەس بڕواداری شادکا، خودای مەزنی شاد کردووە». هەروەها دەبێ قەستی سەردانی خانەخوێ بکا، چونکە سەردانی بڕواداران خێری و ودمی زۆر و زەوەندەیە. هەروەها دەبێ بەڵێن بداتە خۆی کە خوسپە نەکاو لە پاشملەی کەس قسە نەکا تا نەڵێن «بە هۆی ئاکار نزمی و لووت بەرزییەوە نەهات».

بە هۆی هەریەک لەم شەش نییەتەوە پاداشێکی دەگاتێ و ئەوەی موباحە[1]، لەم سۆنگەوە دەبێتە هۆی نزیکبوون بە پەروەردگارەوە. گەورەکانی دین تێکۆشاون تا بۆ هەر جووڵە و نەجووڵانی نییەتێ بێنن کە دەگەڵ دین پێوەندییەکی بێ تا هیچ چرکەیەکیان بە خۆڕایی نەفەوتێ.

## نەریتی ئامادە بوون لە میوانی

نەریتی بەشداری کردن لە میوانیدا ئەوەیە کە خانەخوێ و میوانانیتر چاوەڕوان نەهێڵێ؛ لەز و بەز نەکا و لە لای سەروو ڕۆنەنیشێ و لەوێ بنیشێ کە خانەخوێ بۆی دیاری دەکا؛ ئەگەر میوانیتر تکایان لێ کرد لە ژووری کۆڕ دابنیشێ، ئەم خۆ خوار بگرێ؛ لە بەرانبەر ژووری ژنان دانەنیشێ و زۆر سەیری ئەو شوێنەی چێشت لەوێ دێنن نەکا. کە دانیشت، دەگەڵ ئەوانەی لە تەنشتین، سلاو چاک و چۆنی کا.

ئەگەر کردەوەیەکی ناحەزی بینی، بەرەنگاری بێتەوە، ئەگەر پێی نەکرا بێتە دەرەوە. ئەحمەدی حەنبەل گوتوویە: «ئەگەر کەسێک لە میوانیدا کلدانی زێڕینی بینی، نابێ لەوێ ڕاوەستێ». کە شەو بڕیار بوو لەوێ بمێنێتەوە، خانەخوێ دەبێ شوێنی تارەت و نوێژی بۆ ڕەچاو کا و قیبلەی پێ پیشان بدا.

## نەریتەکانی دانانی خواردن

**یەکەم** - دەبێ پەلە کا بۆ دانانی خواردن؛ ئەمە بۆ ڕێز لێنانی میوانە تا چاوەنۆڕ نەمێنێ. ئەگەر میوانان بێجگە لە یەکیان هەموو هاتبوون، نابێ چاوەڕوانی ئەو یەکە بن؛ مەگین ئەوەی کە ئەو کەسە

---

[1] - واتە ئەو کارانەی کە موباحن (نە پاداشیان هەیە و نەسزا) کە ئەم نییەتانەیان دەگەڵ بوو، دەبنە هۆی نزیکی بە خودا و پاداشیان دەگاتێ.

هەژار بێ و بەم کارە بە خۆدا بشکێتەوە و زیز بێ. لەو کاتەدا چاوەڕوان بوون بەدەوترە.

حاتەمی ئەسەم دەڵێ: «پەلە هی شەیتانە مەگەر لە پێنج شتدا: دانانی خۆراک بۆ میوان، خستنەڕێی مردوو، مارەبڕینی کچ، دانەوەی قەرز و پاشگەزبونەوە لە گوناح». دانانی خواردن لە سوردا سوننەتە.

**دووەم** - سەرەتا دەبێ میوە دابنێن. دەبێ لەسەر سفرە، سەوزی بێ؛ چونکە بێژراوە «فریشتەکان بەشدار دەبن». دەبێ سەرەتا خواردنی خۆشتر دابنێ تا تێری لێ بخۆن. خووی فرەخۆران وایە کە چێشتی خەست دادەنێن تا زۆرتر بخۆن؛ ئەمە ناحەز و گوناحە. تاقمێ پێکڕا هەموو جۆری خواردنەکان رادەنێن تا هەرکەس هەرچی پێی خۆشە هەڵگرێ. ئەگەر هەمە جۆر خۆراکیان پێکڕا دانا، نابێ زوو بیگێڕنەوە، تا هەمووان لێی تێر بخۆن.

**سێهەم** - خۆراکی کەم دانەنێ؛ چونکە بە دوور لە مێرخاسیبە. لە رادەبەدەریش دانەنێ، چونکە نیشانەی خۆ بەزل زانی و لووت بەرزییە؛ مەگین بەو مەبەستەی کە ئەوەی لە پێش میوانان دەمێنێتەوە خواردنی نایەتە هەژمار[1].

ئیبراهیمی ئەدهەم خواردنی زۆری لێنا. سۆفییەکان گوتیان: «ناترسی ئەمە زێدەڕۆیی بێ؟» ئیبراهیم گوتی: «لە خۆراکدا زێدەڕۆیی نییە».

دەبێ سەرەتا بۆ خێزانی دابنێ، تا چاویان لە سفرە و خوان نەبێ؛ چونکە ئەگەر هیچ نەمێنێتەوە، رەنگە سووکایەتی بکەن بە میوان و ئەمەش زۆر ناحەزەو تاوانێکی گەلێک قورسە. میوانەکان بۆیان نییە دەگەڵ خۆیان خواردن ببەنەوە، هەر وەکوو چۆن هەندێ سۆفی وادەکەن؛ مەگەر ئەوەی خانەخوێ بە راشکاوی بڵێ وابکەن، نەک بە هۆی شەرم و شوورەییەوە، یا خۆ دڵنیا بن لەوەی کە پێی خۆشە، ئەو کات بووز دەخوا، بەڵام بەو مەرجەی ستەم لە هاوکاسەیان نەکەن. ئەگەر زۆرتر هەڵبگرێ حەرامە؛ ئەگەر خانەخوێ پێی ناخۆش بێ حەرامە و لەگەڵ دزیەتی جیاوازی نییە. هەرچی هاوکاسەش بیهێڵێتەوە -بە شەرم نەک رەزا - خواردنی ئەوەش حەرامە.

## نەریتی هاتنەوە لە میوانی

دەبی سەرەتا ئیزن بخوازێ و پاشان بێتە دەرەوە. خانەخوێش دەبێ تا بەر دەرکی ماڵ روانەیان کا، چونکە وای فەرمووە.

خانەخوێ دەبێ گفتی خۆش و رووی گەش بێ؛ ئەگەر میوان تاوانێکی کرد، بە ئاکار بەرزی لێی ببوورێ، چونکە ئاکاربەرزی لەو کردە بەرزانەیە کە دەبێتە هۆی نزیکی بە خوا.

---

[1] ـ ئاماژەیە بەوەی کە هەرکەس پاشماوەی میوانانی بخوا بۆی نائژمێردرێ. (ئامێدیان).

دەڵێن «منداڵێ بانگی لە جونەید کرد کە بابم داوەتی کردووی. کە گەیشتنە بەردەرکی ماڵ، بابی منداڵ ئیزنی چوونەژووری نەدا؛ گەڕایەوە. جارێکیتر منداڵە بانگی لێکرد، دیسان گەڕایەوە بەردەرکی ماڵی منداڵە و دیسان بابی ئیزانی چوونە ژووری نەدا و گەڕایەوە. بە هەمان چەشن چوار جار گەڕایەوە تا منداڵەکە پێی خۆش بێ و دڵی بابیشی نەرم بێ و بۆ خۆیشی ڕزگار بوو. بۆ هەر جواو کران و گوێ بە بانگی منداڵەکەدان، حیکمەتێک دەکاردا بوو و هۆکەی بە کەسێکیتر دەزانی[1]».

---

[1] ـ واتە هۆکەی بە پەروەردگار زانیوە.

## بنەمای دووەم - نەریتەکانی ژن هێنان

هەڵبژاردنی هاوسەر لە نەریتەکانی ڕێبازی دینە، وەکوو خواردن. بڕینی ڕێبازی پڕ لە هەورازی دین، پێویستی بە ژیان و بەردەوامی مرۆڤە و ژیان بە بێ خواردن و خواردنەوە بووز ناخوا. هەروەها مانەوەی بەرەی مرۆڤ پێویستی بە پێوەندی ژن و مێرد هەیە. کەواتە نیکاح هۆی بوونەو و خواردن هۆی مانەوە و ژین. ئیزن دان بۆ ژن هێنان و شووکردن بەم بۆنەیە، نەک شاوەت؛ تەنانەت پەروەرگار بۆیە شاوەتی ئافراندووە تا دنەدەرێ بێ بۆ مرۆڤ کە ببێتە هۆی بەردەوامی بەرەی مرۆڤ و خەڵکی هان بدرێن بۆ ژن هێنان و شووکردن، تا لەم سۆنگەوە ڕێڕەوانی ڕێبازی پەروەردگار بێنە دونیاوە؛ چونکە هەموو خەڵکی بۆ ئەوەی ئافرێندراون تا ببنە ڕێبواری ڕێی دین. بۆیە گوتی: وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ[1].

هەرچەند بەرەی مرۆڤ پتر بن، بەندەکانی خودای مەزن زۆرترن و ئوممەتی مستەفاش فرەتر دەبن، بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «ژن بێنن و مێرد بکەن تا زۆر بن، چونکە من ڕۆژی پەسڵان لە هەمبەر ئۆممەتی پێغەمبەرانیترەوە، شانازیتان پێوە دەکەم. تەنانەت بە منداڵێکیش کە لە پزدانی داکیدا بێ».

کەواتە پاداشی ئەو کەسەی کۆشەوە دەکا تا کەسێکیتر بێنێتە دونیا بۆ بەندەگی خودا، گەلێک زۆروزەوەندەیە.

بەم بۆنەیە کە ڕێزی باب گەلێک زۆرە و ماموستاش زۆر هێژایە؛ چونکە باب هۆی هاتنەدییەو ماموستا هۆی ناسینی ڕێ. هەندێ گوتوویانە نیکاح کردن هێژاترە لە خوێندنی نوێژی سوننەت.

کە خویان بوو ژن هێنان و مێرد کردن لە ریزی کردەکانی ڕێی دینن، ڕاڤە و شرۆڤەی نەریتەکانی نیکاح گرینگن. بۆ لێکدانەوەی، سەرەتا دەبێ سی بەش باس بکرێ: بەشی یەکەم، لە قازانج و زیانەکانی نیکاح؛ بەشی دووهەم، لە نەریتەکانی مارەبڕین؛ بەشی سێهەم، لە نەریتەکانی پێکەوە

---

[1] ـ قورئان (٥٦/٥١) من هەر بۆیە جندۆکە و مرۆم دروس کرد، بمپەرستن. (هـ).

ژیانی پاش مارەبڕین.

**بەشی یەکەم - قازانج و زیانەکانی نیکاح**

هێژایی نیکاح لە بە بۆنەی بەهرەکانیە و ئەو بەهرانەش پێنجن:

**قازانجی یەکەم** بە هۆی مندالە و چوار خێری هەیە:

**خێری یەکەم** - ئەوەیە کە هان بدا بۆ جێ بە جێکردنی ئەوشتانەی لە لای خودا خۆشەویستن، وەکوو هاتنە دی و بەردەوامی بەرەی مرۆڤ. ئەوەی لە نهێنی و رازی ئافراندنی جیهان گەیشتبێ چاک دەزانێ کە ئەمە لە لای پەروەردگار چەن هێژایە. ئەگەر ئاغایەک زەمینێکی کشت و کاڵ بداتە نوکەرێکی و توو و جووتێ گاو ئامرازی کشت و کاڵ و بریکارێکی دەگەڵ بنێرێ کە دنەی بدا بۆ کشت و کاڵ، ئەگەر نەختێ ئاوەزی بێ دەبێ بزانێ مەبەستی خودانی چ بووە، هەر چەند بە زار پێی نەگوتبێ.

پەروەرگار، کە یزدان و هۆی پێوەندی ژن و پیاوێ خولقاندو شاوەتی وەک بریکارێ بە سەردا داسەپان و تووی مندالی لە پشت و سنگی ژن و پیاودا دانا، هۆی ئەم کارە لە هیچ ژیرێک بەرپێوار نییە. ئەوەی گەرا بفەوتێنێ و بریکار بە فێڵێک لە خۆ بکاتەوە، بێ گومان لە ڕێی فیترەت کلا بووە. بەم بۆنەوە بوو کە پێشوونان و یارانی پێغەمبەر -خوایان لێ رەزا بێ- بە زگوردی مردن لە لایان دزیو و ناحەز بوو. تەنانەت دەڵێن مەعاز دوو ژنی بە هۆی بامرنێوە[1] مردن، بۆ خۆشی تاعوونی تووش بوو، گوتی: «بەر لەوەی بمرم ژنم بۆ بێنن، نامەوێ بە سەڵتی بمرم».

**خێری دووهەم** - ئەوەیە کە هانی دابێ لەسەر حەزی پێغەمبەری خودا، تا ئوممەتەکەی پتر بن و ببنە هۆی شانازی پێغەمبەر. بۆیە نەهی کردووە لە هێنانی ژنی نەزۆک، چونکە مندالی نابێ. هەروەها گوتوویە: «بەڕێک کە لە ماڵدا راخرێ، چاتر لە ژنی نەرۆکە». دیسان گوتوویە: «ژنێکی دزیو و ناحەز کە بتوانێ مندالی بێ، هێژاترە لە ژنێکی جوان و شووشەیی نەرۆک». بەم چەشنە خویان دەبێ کە نیکاح بۆ شاوەت نییە، چونکە شاوت حەز لە جوان دەکا تا ناحەز.

**خێری سێهەم** - ئەوەیە کە نزای بە خێری مندال بۆ داک و بابی دێتە بەر؛ لە خەبەردا هاتووەکە

---

[1] ـ بامرنێ: طاعون.

«لەو خێرانەی کە بەردەوامە و نابڕێتەوە، یەکیان مندالی چاکە کە دوعای بەخێری پاش مردنی دایک و بابی بەردەوام پێیان دەگا». لە خەبەردایە کە «نزای بەخێر بەسەر تەبەقگەلێ لە رووناکی لەبەر مردووان رادەنێن و لەم سۆنگەوە ئاسوودە دەبن».

**خێری چوارەم** - کە مندال بەرلە بابی ئەمری خودا بە جێ بێنێ، بۆ ئەوەی بابی رەنج و ئازاری دووری لە ئازیز بەر بێ لە گیانی و مندالی ببێ بە تکاکاری. پێغەمبەر فەرموویە: «بە ساوا دەلێن "بڕۆرە نێو بە هەشتەوە"، بە توندی و تووڕەییەوە پەلپ دەگرێ و دەلێ "قەد بە بێ دایک و بابم ناڕۆم"».

پێغەمبەر بەرگی یەکێکی گرتبوو و رایدەکێشاو دەیگوت: «بەم چەشنەی من تۆ رادەکێشم، ساوا دایک و بابی بۆ بەهەشت دەکێشێ».

لە خەبەردایە کە: «ساواکان لەبەر دەرکی بەهشتدا کۆوە دەبن، هاوار دەکێشن و دەگرین و گرۆی دایک و بابیان دەگرن، تا ئەوەی فرمان بدرێ دایک و بابیان لە نێو ئەوانەی کە دەڕۆنە نێو بەهەشتەوە ئامادە بن و هەرکەسە دەستی دایک و بابی بۆ نێو بەهەشت رادەکێشێ».

یەکێک لە گەورەکان خۆی لە ژن هێنان دەبوارد، تا ئەوەی بە خەو بینی رۆژی پەسلانەو ئاپۆرەیەک لە خەلکی بە تینوێتی هەلوەدان و تاقمێ ساوای نۆرەس بە جامی زێرینەوە ئاویان بۆ دەبەن. داوای ئاوی کرد، پێیان نەدا، گوتیان: «تۆ لە نێو ئێمەدا هیچ مندالت نییە». کە لە خەو رابوو، بێ سێ و دوو کردن ژنی هێنا.

**قازانجی دووهەم** - پیاو بە ژن هێنان شوورەیەک بە دەوری دینی خۆیدا دەکێشێ و لە شاوەتی دەپارێزێ؛ چونکە شاوەت ئامرازی شەیتانە. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی نیکاحی کرد، نیوەی لە دینی خۆی پاراست و ئەوانەی نەیانکرد، زۆربەیان پێیان ناکرێ چاو لە روانینی حەرام و دل لە وازوازی بپارێزن، هەرچەند توخنی هیچ ژنێ نەکەون. بەلام دەبێ نیکاح بە مەبەستی هێنانە دونیای مندال بێ نەک بەرگری لە شاوەت؛ چونکە هێژاتر لە لای پەروەردگار منالدار بوون و بەجێهێنانی رەزای خودایە، نەک داسەپاندن و دامراندنی بریکار؛ چونکە شاوەت بۆ دنەدان و هەلخراندنی مرۆڤ ئافرێندراوە، هەر چەن هۆیەکیتریش لەم ئافراندنەدا شاراوەیە. هەروەها چێژ و حەزێکی ئێجگار مەزنیان تێدا داناوە تا نوێنەری چێژەکانی دوارۆژ بێ. هەروەکوو چۆن ئاور ئافرێنداوە تا نوێنەری رەنجی دۆژەەبێ. دەبێ ئەوەش بزانرێ کە ئازاری ئاوری دونیا و چێژی شاوەت زۆر بچووکن لە هەمبەر چێر و ئازاری دوارۆژ. پەروەردگار هەر شتەکی لەسەر هۆیەک ئافراندووە، رەنگە لە شتێکیشدا

هۆی جۆراوجۆر بن و بێجگە لە زانایان کە هەمووان بەر پیوار بن».

پێغەمبەر فەرمووی: «هەر ئافرەتێک کە رابورد، شەیتانێکی دەگەڵە. کە کەسێک ژنێکی جوانکیلەی بینی، دەبێ دەم و دەس بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی و نزیکی ئافرەتی خۆی کەوێ؛ چونکە ژنان لەم چێژەدا وەکوو یەکن».

**قازانجی سێهەم** - ئاخاوتن و دانیشتن دەگەڵ ژنان دەبێتە هۆی هێور بوونی دڵ و ئەم هێمن بوونەش دەبێتە هۆی تازەبوونەوەی حەز لە عیبادەت؛ چونکە چاودێری بەسەر عیبادەت، دەبێتە هۆی دڵتەنگی و وەڕس بوون، کەچی ئەم هێمنیە، دڵ بۆ عیبادەت دەبووژێنێتەوە.

عەلی دەڵێ: «هێمنی و ئاسایش بە یەکجاری لە دڵتان مەگرنەوە، چونکە دڵ بە گوێرەی ئەوە کوردە بێ».

پێغەمبەر لەو دەمانەی سەری لە تەشقی ئاسمان دەهەنوو و خەریکی سەیری جیهانی فریشتەکان بوو و لە جیهانی مرۆڤان دوور دەکەوتەوە و جەستەی توانی پێ نەدەما و دڵی قورس و تەنگ دەبوو، دەیدا بەسەر ڕانی عایشە و دەیگوت: «کلمینی»؛ واتە، عایشە قسەم دەگەڵ کە: دەیویست ورە و هێزی وەبەرکەوێ تا توانی بۆ هەڵگرتنی باری وەحی پترکا. کە چێژی ئەم دونیایەی پێ دەدرا و لێی تێر دەبوو و دڵی لێی تەنگ دەبوو، تینووی ڕۆچوونەوە دەنێو جیهانی سەروو دەبوو و دەیگوت: «ارحنا یا بلال» و رووی لە نوێژ خوێندن دەنا. هەندێ جار بە بۆنی خۆش خۆی بە هێز دەکرد؛ بۆیە دەیفەرموو: «حُبِّبَ الَیَّ مِن دُنیاکُم ثَلاث: اَلطِّیبُ وَالنِّساءُ وَ قُرَّةُ عَینِ فی الصَّلاة»؛ واتە: سێ شتیان لەم دونیایە کردۆتە دۆستم: بۆن و بەرامەی خۆش، ژن و ڕووناکی چاوم لە نوێژایە.

بەڵام نوێژی لە لا تایبەت بوو کە فەرمووی: «ڕووناکی چاوم لە نوێژدایە». بەرامەی خۆش و ژنی بۆ هێمنی و ئاسوودەگی لەشی دەویست تا هێز و خۆستی بۆ پەرژانە سەر ڕووناکی چاوانی پتر کا.

لەم سۆنگەوە پێغەمبەر لۆمەی ئەو کەسانەی دەکرد ماڵوسامان کۆرە دەکەن. عومەر لێی پرسی: «کەواتە، چ شتێ دەبێ لە دونیا بگرین؟» گوتی: «لِتَتَّخِذ اَحَدُکُم لِساناً ذاکِراً وَ قَلباً شاکِراً وَ زَوجَةً مُؤمِنَةً»؛ واتە: زمانێ پڕزیکر، دڵێ پڕ شوکر و ژنێکی بە بڕوا؛ ژنی بڕواداری کردۆتە هاوشانی یاد و شوکر.

**قازانجی چوارەم** - ئەوەیە کە ژن خەریکی ماڵداری و چێشت لێنان و خاوێن کردنەوە و بێ؛ چونکە ئەگەر پیاو خەریکی ئەم کارانە بێ لە زانست و کار و عیبادەت دوور دەبێتەوە. بەم بۆنەوە ژن لە ڕێی دیندا ئاریکارە.

بۆیە ئەبوو سلەیمانی دارانی گوتوویە «ژنی بڕوادار هی دونیا نییە، هی دوارۆژە». واتە، هەلێکت بۆ دەڕەخسێنی تا بپەرژێتە سەرکاری دوارۆژت. عومەر دەڵێ «پاش ئیمان، هیچ خێر و چاکەیەک هێژاتر لە ژنی کابان و شیاونییە».

**قازانجی پێنجەم** – پشوو درێژی لەسەر ئاکاری ژنان و پێک هێنانی کاروباریان و ڕاگرتنیان لەسەر دین و شەرع کۆشەوەی زۆری دەوێ و ئەم کۆشەوەیە لە هێژاترین عیبادەتەکانە.

لە خەبەردا هاتووە کە بژیوی ژن و منداڵ لە سەدەقە هێژاترە. گەورەکان گوتوویانە «دەرهێنانی نانی حەلاڵ بو ژن و منداڵ کاری عەودالانە».

ئیبنولمبارەک دەگەڵ تاقمێ لە گەورەکان لە خەزادا بوون. یەکیان گوتی: «هیچ کردەوەیەک هەیە هێژاتر لەوەی ئێمە خەریکین؟» گوتیان «هیچ نییە». ئیبنولمبارەک گوتی: «من دەزانم؛ کەسێک کە ژن و منداڵی بێ و بە چاکی ڕایانگرێ و بە خێویان کا. بە شەو لە خەوڕابێ، منداڵانی ببینێ کە پێخەفیان لەسەر خۆ لا داوە و ئەم دایانپۆشێ. ئەم کردەوەیە بەرزتر و هێژاترە لەم خەزایەی ئێمە».

بێشری حافی گوتی: «ئەحمەدی حەنبەڵ سێ چاکەی هەیە کە من نیمە: یەکەم ئەوەی کە ئەو بژیوی حەلاڵ بۆ خۆی و خێزانی دەردێنێ و من هەر بۆ خۆم تێدەکۆشم».

لە خەبەردا هاتووە کە هەندێ گوناح هەیە کە تەنیا بە ڕەنج و ئازارکێشان بۆ خێزان لە دەفتەری کردەوەکان دەسڕێنەوە.

یەکێک لە گەورەکان ژنەکەی مرد. هەر چەند پێیان گوت ژن بێنە، گوێی نەدا و گوتی: «لە تەنیاییدا دڵ تەیارتر دەبینم بۆ پەرستنی پەروەردگار». شەوێک لە خەودا دی دەرگەکانی ئاسمان ئاوەڵان و تاقمێ لە پیاوان یەک بە دوای یەک دێنەخوار و لە ئاسماندا دەفڕن؛ کە بەو گەیشتن یەکەم پیاو گوتی: «ئەمە ئەو پیاوە بەد فەڕەیە؟» دووەمینیان گوتی: «ئەرێ». سێهەمیان پرسی: «ئەمە ئەو پیاوە بەدفەڕەیە؟» چوارەم گوتی «خۆیەتی». زۆر ترسا لەوانەی وایان پرسی. تا دواییینیان گەیشت و پێی گوت: «بەدفەڕ بە کێ دەڵێن؟» گوتی: «بە تۆ دەڵێن کە تا حەوتەیەک پێش ئێستا کردەوەکانتیان لەگەڵ کردەوەی خەزاکەراندا دەهێنا، کەچی ئێستا لەو ڕیزە هاتوویتە دەر نازانم چت کردووە.» کە لە خەو ڕابوو بێ سێ و دوو ژنی هێنا تا لەڕیزی خەزاکەراندا بێ.

لەم سۆنگەیە کە ژن هێنان و مێرد کردن بە خێرووەدمە.

**بەلام زیانەکانی نیکاح سێن:**

**زیانی یەکەم** - ئەوەیە کە لە بە دەست هێنانی بژیوی حەڵاڵدا تووشی تەگەرە بێ و ناچار روو لە ماڵی حەرام بنێ. ئەوەش دەبێتە هۆی فەوتاندنی دینی خۆی و خێزانی. هیچ کارێکی بە خێر و ودمیش ناتوانێ پاسای ئەم کارە بکا؛ چونکە لە خەبەردا هاتووە کە «پیاو دەبرێتە لای سەنگ و ترازوو و کردەکانی لە پێوانە دەدرێن. دەبینن کە کاری چاکی زۆرە و هەریەکەیان بە قەدەر کێوێکن؛ لێی دەپرسن بژیوی ژن و منداڵت لە کوێ هێنا؟ لەم بابەتەوە لێی دەپرسنەوە تا ئەوەی هەموو چاکەکانی لەم سۆنگەوە بووچەڵ دەبنەوە. پاشان دەنگ هەڵدەبڕن و دەڵێن "ئەمە ئەو کەسەیە کە خێزانی نووک‌وبەدی چاکەکانیان خواردووە و ئەمیش تووش بووە».

لە حەدیسدا هاتووە کە «یەکەم کەسێک کە لە ڕۆژی پەسڵاندا بەربینگی پیاو دەگرێ، خێزانیە. دەڵێ: ئەی پەروەردگار! تۆڵەی ئێمەی لێی بستێنە، چونکە بژیوی حەرامی پێ داین و ئێمە نەمانزانی و زانستی پێ فێر نەکردین و بە نەزانی هێشتینیەوە».

کەواتە ئەوەی ماڵ‌وسامان یان میراتی یا خۆ کارێکی حەڵاڵی نەبێ، نابێ ژن بێنێ، مەگین ئەوەی دڵنیا بێ توخنی ژنی تر دەکەوێ.

**زیانی دووهەم** - بەبێ ئاکاری بەرز و پشووی درێژ ناتوانێ ئەرکی خۆی لە هەمبەر خێزانیەوە بە جێ بێنێ و کارەکانیان جێ بە جێ کا. هەرکەس ئەمەی پێ ناکرێ. بۆیە ڕەنگە بیانڕەنجێنێ و بەم جۆرە تووشی گوناح بێ و کارەچاکەکانی بدۆڕێنێ.

لە خەبەردا هاتووە کە «ئەوەی لە خاو و خێزانی خۆی ببوێرێ، وەکوو کۆیلەیەکی هەڵاتووە: تا نەگەڕێتەوە لایان و پەرایان نەکا نوێژ و ڕۆژووی لێ وەر ناگیرێ».

بە بوشری حافییان گوت: «بۆچی ژن ناهێنی؟» گوتی لەم ئایەتە دەترسم وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ[1].

بە ئیبراهیمی ئەدهەمیان گوت: بۆ ژن ناهێنی؟ گوتی: «من کە هیچ نیازێکم بە ژن نییە، چۆن ژن بە خۆم هیوادار کەم؟»

**زیانی سێهەم**: ئەوەیە کە دڵ بە تەواوی نوقمی جێبەجێ کردن و دابین‌کردنی ئاسایش و هێمنی ژن و منداڵ بێ و لە دابین‌کردنی توێشووی دوارۆژ بێ ئاگابێ. ئەوەی یادی خودات لە بیر باتەوە،

---

١ ـ (قورئان، ٢٢٨/٢) ژنەکانیش مافی ڕەوای خۆیان هەیە. (هـ).

هۆی فەوتان و زیانتە. بۆیە خودا فەرمووی: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ.[1]

کەواتە: ئەوەی لە خۆی دڵنیا نەبێ کە پەرژانە سەر کاروباری ژن و منداڵ، یادی خودای لە بیرناباتەوە -بەو چەشنەی پێغەمبەر وابوو- و بزانێ کە ئەگەر نیکاح نەکا تووشی گوناح نابێ و یادی خودای لەسەر دڵ بەردەوامە، ژن نەهێنان و مێرد نەکردن بۆی شیاوترە. مەگین ئەوەی ماڵی حەلاڵی هەبێ و لە ئاکار و میهرەبانی خۆی ئارخەیان بێ و باش بزانێ ژن هێنان یا خۆ مێرد کردن، یادی خودای لە بیر ناکا و ئەگەر نیکاح کا، پتر لە خودا نزیک دەبێ و تووشی زیان نابێ.

**بەشی دووەم - چۆنیەتی مارەبڕین و نەریتەکانی و ئەودانستانەی ژن دەبێ هەیبێ**

مەرجەکانی نیکاح پێنجن:

**یەکەم** - بوونی سەرپەرشتە. بە بێ سەرپەرشت مارەیی نایە. ئەوەش سەرپەرشتی نەبێ، خونکار، سەرپەرشتیە.

**دووەم** - رازی بوونی ژن، مەگین ئەوەی کچ بێ و بابی یان باپیری بەبێ ئیزن و رەزای کچ دەتوانێ مارەی ببڕێ. چاتر وایە لێی بپرسن، ئەگەر بێدەنگ بوو و هیچی نەگوت، بەستە بۆ مارەبڕین.

**سێیەم** - دوو شایەتی بەداد دەبێ ئامادە بن. چاتر وایە کۆمەڵێک پیاوی ماقووڵی چاکەکار ئامادە بن و بە دوو کەس قنیات نەکرێ. بەڵام ئەگەر دوو پیاو بن کە خراپەیان لە کەس خویان نەبێ، ئەوەش هەر دەبێ.

**چوارەم** – دەبێ گەورەی کچ یان بریکاری و مێردی کچ هەردووکیان پەیڤی «ایجاب» و «قبول» بە راشکاوی بڵێن.

هەروەها پەیڤی نیکاح یان تەزویج یاخۆ کوردییەکەی دەبێ بڵێن. سوننەت وایە کە سەرپەرشتی کچ پاش خوێندنی خۆتبە بڵێ: «بسم‌الله الرحمن الرحیم؛ فلان‌کەسم لەسەر فلان مارەیی بە تۆدا». مێردی کچەش بڵێ: «بسم‌الله الرحمن الرحیم؛ بەم مارەییە قەبوولم کرد.» باشتر وایە پیاو بەر لە مارەبڕین چاوی بە بووکەکەی بکەوێ، تا ئەگەر حەزی لێ بوو، مارەی ببڕێ؛ چونکوو زۆرتر بۆی دەلوێ خۆشەویستی لە نێوانیاندا پێک بێ. دەبێ مەبەست لە ژن هێنان، مناڵدار بوون و پاراستنی

---

١ ـ قورئان (٩/٦٣) سامان و زارۆڵەکانتان یادی خواتان نابا لە بیر بەرنەوە. (هـ).

چاو و دڵ لە کلابوون لە ڕاستەڕێ بێ و شیاو نییە سەروبەری مەبەستێ لە ژن هێنان چێژ و خۆشی و شاوەت بێ.

**پێنجەم** – ژن دەبێ لەو دانستانەی مارەیی پووچەڵ دەکەنەوە بە دوور بێ. ئەو دانستانە بیستن و بریتین لە: لە مارەیی کەسی‌تردا بێ، لە ئاڤێری پیاوی‌تردا بێ، لە دین دەرچووبێ، بت پەرست بێ، یا لە دین بێوەری بێ، بڕوای بە خودا و پێغەمبەر و ڕۆژی بەسلان نابێ، یاخۆ ئەباحەتیەک کە پێکەوە دانیشتن و هەستانی ژن و مێرد لە لای ڕەوا بێ و هیچ نوێژ نەکا و بڵێ: «ئەمە بۆمە ئاساییە و هیچ تووشی گوناحمان ناکا»؛ فەلە یان جوویەک کە لە تۆرەمەی کەسانێک بێ کە پاش هاتنی پێغەمبەری ئیسلام بووبێتنە فەلە و جوو، یا خۆ کۆیلە بێ و پیاوەکە بتوانێ ئافرەتێکی ئازاد بێنێ، یاخۆ پێی بکرێ تووشی زینا نەبێ، یا خۆ بەشێکی یان بە تەواوی هی ئەو کەسەی بێ دەیەوێ بیهێنێ، یاخۆ مەحرەم و خزمی نزیکی پیاو بێ، یان بە هۆی شیرەوە لێک حەرام بن، یا لە سۆنگەی ژن و ژنخوازەوە لێک حەرام بن، هەر وەکوو ئەوەی پێشتر دەگەڵ منداڵانی نیکاحی کردبێ یان دەگەڵ کچ و یا کچەزای، یا خۆ لە دایک و دایە گەورەی نیکاحی کردبێ و توخنی کەوتبێ، یاخۆ ژنی لە مارەیی باب یاخۆ کوڕیدا بووبێ، یاخۆ پیاوەکە بێجگە لەم ژنە چوار ژنی‌تری هەبێ و ئەمەش پێنجەم بێ؛ یاخۆ پوورو یا خوشکی ژنی خۆی کە لە مارەییدا بێ حەرامە هەردووکیان پێکەوە بێنێ؛ یاخۆ دوو ژن کە خزمایەتییەکی نزیکیان لە نێواندا بێ، بە چەشنێ کە ئەگەر یەکێکیان ژن بایە و یەکیان پیاو، نەیاندەتوانێ پێکەوە زەماوەند کەن، ئەم دوو کەسە ناتوانن پێکەوە ببنە ژنی یەک کەس؛ یاخۆ ژنێ پێشتر ژنی پیاوێ بووبێ و سێ‌تەلاقەی کردبێ یاخۆ سێ‌جار کڕیبێتی و فرۆتبێتی: تا مێردی‌تر نەکا پێی حەلاڵ نابێ؛ یاخۆ لەحنەتیان لێک کردبێ[1]؛ یاخۆ ئەوەی ژن یا پیاو لە ئیحرامی حەج یان عومرە بێ؛ یاخۆ کچەکە سێوی بێ و منداڵ، تا بالق نەبێ مارەیی نایە.

سەرجەمی ئەم ژنانەی بێژران مارەییان نایە. ئەمانە مەرجەکانی حەلاڵ و دروست بوونی نیکاحن.

## تایبەتمەندییەکانی ژن لە مارەبڕیندا

ئەو دانستانەی ژن لە کاتی مێردکردندا دەبێ بیبێ، هەشتن:

**دانستەی یەکەم** – پارێزکاری؛ ئەمە سەرەکیترین دانستەیە، چونکوو ژنی ناپارێزکار، ئەگەر لە ماڵ

---

١. پیاوێ کە بڵێ ژنەکەی زنیای کردووە، ئیمام بێیان دەڵێ کە لەحنەت لە یەکتری بکەن و ئیدی قەد ناتوانن ببنە هاوسەری یەک: ئەگەر منداڵیشیان بێ لە پیاوەکە هیچ میرات نابا.

دەغەڵ کا، گەورەیی پیاو تێک دەدا؛ ئەگەر داوێن پیسی بکا: گەر پیاوەکە گوێی خۆی کپ کرد، لە نەبوونی پیاوەتی و مێرخاسی و لاوازی دینە و لە نێو خەڵکا رووڕەش و سەرشۆڕ دەبێ؛ ئەگەر بێ دەنگ نەبوو، عەیشی پێ تێک دەدرێ: ئەگەر لێی جودا بێتەوە، رەنگە بە دڵ هۆگری بێ؛ ئەگەر هەم ناپارێزکاربێ و هەمیش خوشیک، ئەوە بەڵایەکی گەورەترە، کەوابوو چاتر وایە لێی جیا بێتەوە و سێ تەڵاقەی کا، مەگین بە دڵ هۆگری بێ.

یەکێک لە لای پێغەمبەر گلە و گازەی لە ژنێ خۆ دەکرد کە ناپارێزکارە. پێغەمبەر فەرمووی: «تەڵاقی بدە» گوتی: «زۆرم خۆش دەوێ». فەرمووی: «رایگرە، چونکە ئەگەر لێی جیابیتەوە، تۆش تووش دەبی».

لە خەبەردا هاتووە کە: «هەرکەس ژنێکی لەبەر سامان و جوانی راگرت، لە هەر دووکیان بێبەش دەبێ؛ کە لەبەر دین ویستی، بە هەر دوو مەبەستی سامان و جوانی دەگات».

**دانستەی دووەم** – ئاکاری جوانە؛ چونکە ژنێ ناوچاو گرژ بێ نەزان و سپڵە و دەم هەراشە و ناچارت دەکا دەگەڵی توندی کەی؛ رابواردن دەگەڵی ناحەزە و دەبێتە هۆی دۆڕاندنی دین.

**دانستەی سێهەم** – جوانییە؛ چونکە دەبێتە هۆی خۆش ویستن. بەم بۆنەیە کە دیتنی بووک بەر لە مارەبڕین سوننەتە و پێغەمبەر فەرمووی: «لە چاوی ژنانی ئەنساریدا شتەک هەیە کە دڵ حەزی لێ ناکا: هەرکەس ویستی ژنیان لێ بخوازێ، سەرەتا دەبێ سەیریان کا». گوتوویانە : «هەر مارە بڕینێک کە بەر لە دیدار بێ، ئەنجامی خەم و حەسرەت و پەژیوانییە».

ئەوەی کە پێغەمبەر فەرموویە: «ژنتان بەدین گەرەک بێ، نەک بە جوانی»، مەبەست ئەوەیە کە نابێ تەنیا لەبەر جوانی ژن بهێنرێ و گوێ بە دینداری نەدرێ، نەک ئەوەی کە نابێ گوێ بە جوانی بدرێ.

بەڵام ئەگەر کەسێک تەنیا بە نیازی منداڵ و سوننەت ژن بهێنێ و هیچ ئاوڕنەداتە جوانی، ئەمە بەشێکە لە زوهد و پارێزکاری. ئەحمەدی حەنبەل ژنێکی هێنا کە چاوێکی کوێر بوو، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە خوشکی ئەو کچە گەلێک خوشیک بوو؛ بەڵام چونکە گوتیان ئەو کچە یەک چاوە ژیر و تێگەیشتووترە، ئەوی هێنابوو.

**دانستەی چوارەم**– ئەوەیە کە مارەییەکەی کەم بێ، چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «چاترینی ژنان ئەوانەن کە بە مارەیی سووکترن و بە روومەت بەدەوتر». مارەیی زۆر کردن، ناحەزە. پێغەمبەر

هەندێ لە ژنەکانی بە دەرهەم هێناوە و کچانی خۆی بە پتر لە چوارسەد درهەم نەداوە.

**دانستەی پێنجەم**– ئەوەیە کە نەزۆک نەبێ؛ چونکە پێغەمبەر دەڵێ: «رایەخێ کە لە سووچی ماڵ کەوتبێ، چاتر لە ژنی نەزۆکە».

**دانستەی شەشەم**– ئەوەیە کە کچ بێ؛ چونکە زۆرتر خۆشەویستە. ئەوەی مێردێکیتری دیبێ، زۆرتر دڵی لێی دڕدۆنگ و بەگومانە.

جابر بێوەژنێکی هێنابوو. پێغەمبەر فەرمووی: «بۆچی کچێکت نەهێنا، تا هەم تۆ دەگەڵ ئەو و هەم ئەو دەگەڵ تۆ یاری کردایە».

**دانستەی حەوتەم**– ئەوەیە کە لە خانەدانێکی هێژا بێ؛ مەبەست لە خانەدان دیندار و چاکە کارە؛ چونکە ئەوەی خانەدان نەبێ رانەهاتووە و ئاکاری سووکە و رەنگە ئاکاری لە منداڵەکانیدا کاریگەر بێ.

**دانستەی هەشتەم**- ئەوەیە کە لە خزمانی نزیک نەبێ؛ چونکە لە خەبەردا واهاتووە کە «منداڵی ئەو کەسانە، لاواز دەبن». مەگەر بەو بۆنەوە بێ کە شاوەت بۆ خزمان کەمتر و لاوازترە.

ئەمانەیە دانستەی ژنان

بەڵام سەرپەرشتێ کە دەیەوێ کچی خۆی بداتە شوو، لە سەریە کە چاکەی کچەی لەبەر چاوبێ و کەسێکی بۆ هەڵبژێرێ کە شیاو و لە بار بێ و خۆ لە پیاوی مۆن و ناوچاو گرژی کرێت و بەرتەشک، کە پێی نەکرێ بژیوی ژینی ژن و منالی دابین کا- بپارێزی. نابێ کچ بداتە ناپاک و داوێن پیس. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس کچ بەداوێن تەڕ بدا، خۆشەویستیان دەناودا نامێنێ». دیسان فەرمووی: «نیکاح کۆیلەییە؛ بزانە منداڵی خۆت دەکەیتە کۆیلەی کێ؟»

## بەشی سێهەم – نەریتەکانی ژیان دەگەڵ ژنان لە سەرەتای مارەبڕینەوە تاکۆتایی

کە خۆیان بوو نیکاح بنەمایەکە لە بنەماکانی دین، دەبێ مەرجەکانی دین تێدا جێبەجێ بکرێ؛ ئەگینا هیچ جیاوازییەک نابێ لە نێوان ژن هێنان و شووکردنی مرۆڤ دەگەڵ جووتبوونی چوار پێیاندا. کەواتە دەبێ بۆ نیکاح دوازدە نەریت جێبەجێ بکرێ:

**یەکەم** سووردانە. ئەمە سوننەتێکە کە پێداگری لەسەر کراوە. کاتێ عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف

ژنی هێنا، پێغەمبەر فەرمووی: «أَوْلِمْ وَلَوْ بَشاء»؛ واتە: میوانی بدە هەرچەن تەنیا بە مەڕێک بێ.
ئەوەش مەڕی نەبێ، ئەگەر نەختێ خواردن لە پێش دۆستانی دانێ، ئەوەش میوانییە. پێغەمبەر کاتی سەفیەی مارە کرد، بە ئاردی جۆ و خورما سووری دا. کەواتە هەر ئەوەندە کە بۆی دەلوێ بۆ گەورە راگرتنی کاری نیکاح، دەبێ بکاتە خەرجی میوانی. ئەم سوورە نابێ لە سێ رۆژی یەکەم لابدا، ئەگەر لایدا، نابێ لە یەک حەوتە تێپەڕێ.
دەف لێدان و هەلهەلە و شادی بۆ ئاشکراکردنی نیکاح، سوننەتە؛ چونکە هێژاترین ئافرێندراوی سەرزەوی، مرۆڤە و سەرەتای ئافراندنی ئەویش نیکاحە. ئەم شادییە جێگای خۆیەتی و دەف و هەلپەڕکێ لەم کاتەدا سوونەتە.
دەگێڕنەوە لە رەبیع کچی موعەووەز کە گوتوویە: «ئەو شەوەی کە کرام بە بووک، بەیانییەکەی پێغەمبەر هاتەدەر، کەنیزەکان دەفیان لێ دەدا و گۆرانییان دەگوت؛ کە پێغەمبەریان دی خەریکی گوتنی پەسنی پێغەمبەر بوون بە گۆرانی. پێغەمبەر فەرمووی: "هەر ئەوەی بلێن کە سەرەتا دەتانگوت"و نەیهێشت پەسنی ئەو بلێن». چونکە کاری بە راستی دەگەڵ یاری و جەفەنگ نابێ تێکەڵ بێ و پەسنی ئەویش بەراست و بە دوور لە گاڵتەیە.

**دووەم** – دەگەڵ ئافرەت و ژنان بە رووی گەش هەڵس و کەوت کردن. مەبەست لە رووی گەش و ئاکاری بەرز ئەوە نییە کە نەیانڕەنجێنێ، بەڵکوو دەبێ ئازاری ئەوان بکێشێ و نگەرانی و رەنجیان بسڕێتەوە و نەهێڵێ خەم و کەسەر دایانگرێ. لە هەمبەر گوێ نەدان و پێنەزانییان پشوودرێژ و لەسەرخۆ بێ. لە خەبەردا هاتووە کە ژن لە لاوازی و شەرم ئافرێندراوە: دەرمانی لاوازییان بێدەنگییەو و دەرمانی شەرمیان، مانەوەیان لە ماڵدایە».
پێغەمبەر دەڵێ: «هەرکەس لە بەرانبەر رووی گرژ و مۆنی خێزانیەوە پشوودرێژ و بەکاوەخۆ بێ، پاداشێکی پێ دەدرێ کە بە ئەیووب لە بەرانبەر چەرمەسەرییەکانیەوە درا. هەروەها هەر ژنێک کە لە بەرانبەر ئاکاری چرووکی مێردیەوە پشوودرێژ بێ، ئەو پاداشەی کە درایە ئاسیەی ژنی فیرعەون، پێی دەدرێ». دوایین پەیڤێک کە لە سەرەمەرگدا لە پێغەمبەر بیسرا سێ شت بوو: «نوێژ بخوێنن؛ چاکە دەگەڵ کۆیلەکانتان کەن؛ ئەڵلا ئەڵلا لە باسی ژنان، چونکە ئەمانە یەخسیرن لە دەستی ئەنگۆدا، دەگەڵیان بە چاکی بجووڵنەوە».
پێغەمبەر لە بەرانبەر توند و تووڕەیی ژناندا پیشوودرێژ و لەسەرخۆ بوو. رۆژێ خێزانی عومەر بە توندی دەگەڵ عومەر دەدوی. عومەر گوتی: «ئەی نەفام! وەرامم دەدەیتەوە؟» گوتی: «ئەرێ، چونکە پێغەمبەر لە تۆ چاترە و ژنەکانی وەلامی دەدەنەوە». عومەر گوتی: «ئەگەر وایە، داد لە

حەفسە کە چارەڕەش دەبێ».

پاش ئەوە حەفسەی -کە خێزانی پێغەمبەر بوو- بینی، گوتی: «ئاگادار بە کە لەگەڵ پێغەمبەر توندی نەکەی و چاو لە کچی ئەبووبەکر نەبڕی، چونکە پێغەمبەر ئەوی زۆر خۆش دەوێ و هیچی لێ ناگرێ». جارێک یەکێک لە ژنەکانی پێغەمبەر بە تووڕەیەوە دەستی نا بە سنگیەوە: دایکی لێی تووڕە بوو، گوتی «بۆ وات کرد؟» پێغەمبەر فەرمووی: «با زۆرتر لەمەش کەن، من لێیان دەبوورم». هەروەها فەرمووی: «خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لاهْلِه وَ اَنَا خَيْرُكُمْ لاَهْلي»؛ واتە: چاترینی ئەنگۆ ئەوەیە کە دەگەڵ خێزانی باش بێ. منیش پتر لە هەمووتان لەگەڵ خێزانم چاکم».

**سێهەم** – ئەوەیە کە دەگەڵیان یاری کا و پێبکەنێ و مۆن نەبێ و بە قەدەر ئاوەزیان دەگەڵیان بجوولێ. کەس وەکوو پێغەمبەر دەگەڵ خێزانی رووگەش نەبوو، تا ئەو جێگای کە لەگەڵ عایشە غاریان دەکرد تا بزانن کێ وەپێش دەکەوێ: پێغەمبەر کێبەرکێیەکەی بردەوە؛ جارێکیتر هەڵاتن، ئەمجار عایشە وەپێش کەوت. پێغەمبەر فەرمووی: :یەک بە یەک، کەسمان لە کەس». واتە ئێستا بەرانبەرین.

رۆژێ دەنگی رەشپێستانی بیست کە هەڵدەپەڕن، بە عایشەی گوت: «دەتەوێ بڕۆیتە سەیریان؟» گوتی: «دەمەوێ». هاتنە بەر دەرکە و دەستی لە لاشیپانی دەرگە نا، عایشە چەناگەی لەسەر باسکی ناو ماوەیەکی چاک سەیری کرد. گوتی: «عایشە، بەس نییە؟» گوتی: «بێدەنگ بە». سێ جار پێی گوت، پاشان عایشە گوتی بەستە.

عومەر بەو هەموو راستی و جددەوە کە دەکاراندا بووی دەیگوت : «پیاو دەبێ لەگەڵ خێزانی وەکوو منداڵ بێ، بەڵام کە گەورەیی و مێرخاسییان لێ ویست، وەکوو پیاوان بێ».

گوتوویانە: پیاو کە هاتەوە ماڵ دەبێ لێو بە پێکەنین بێ، کە رۆیشتە دەرەوە بێدەنگ بێ، شتێکی دەست کەوت بخوا ودەستی نەکەوت، لێی نەپرسێتەوە».

**چوارەم** – ئەوەندە یاری و گاڵتە و جەفەنگ نەکا تا خۆی بە تەواوی سووک و بێنرخ کا. لە خراپەدا دەگەڵیان هاوڕایی نەکا، بەلکوو کە کردەیەکیان لێ وەشایەوە بە ئاوەژووی شەریعەت یان پیاوەتی بوو، بە توندی بەرەنگاریان بێ. چونکە ئەگەر لێیان ببورێ، بە سەریدا زاڵ دەبن. «الرجال قَوّامُون علی النساء»، هەموو دەم دەبێ پیاوان بەسەر ژناندا زاڵ بن. پێغەمبەر فەرمووی : «تَعسَ عَبْدُالزَّوْجَه»؛ واتە: سەرنخوونە ئەو کەسەی لە ژێر رکێفی ژندایە، چونکە ژن دەبێ گوێڕایەڵی پیاو بێ. گوتوویانە: «دەگەڵ ژنان راوێژ کەن و بە ئاوەژووی پەیڤی ئەوان بجوولنەوە». لە راستیدا نەفسی ژن وەکی

نەفسی تۆیە، گەر ماوەیەک ئاگای لێ ببڕی، لە ئاستی خۆی تێدەپەڕێ و گران بتوانی دەسەمۆی کەی.

بە کورتی لە ژناندا سستیەک هەیە کە دەرمانی پشوودرێژییە و لارییەکیان هەیە کە دەرمانی ژیرییە. پیاو دەبێ وەکوو پزیشکێکی کارزان بێ و هەر دەرمانێ لە کاتی خۆیدا بنوێنێ. هەروەها دەبێ پشووی درێژ و لە سەرخۆیی بەسەر پیاودا زاڵ بێ، چونکە لە خەبەرەکاندا هاتووە کە«ژن وەکوو پەراسووە، ئەگە راستی کەیتەوە دەشکێ».

**پێنجەم**– ئەوەیە کە لە باسی غیرەت و دەماردا میانەڕەو بێ و لەو شتەی کە بووز دەخوا، زیانێکی تووش بکا، ژنی بپارێزێ. تا بۆی دەکرێ نەهێڵێ بڕواتە دەر و لە سەربان و لەبەر دەرگەدا رانەوەستێ و نەهێڵێ هیچ نامەحرەمێ ببینێ و ئەویش هیچ نامەحرەمێ ببینێ. نەهێڵێ لە رۆژنەو دەلاقەوە سەیری پیاوان کا، چونکە هەموو کارەهاتێ بە هۆی روانینەوە تووش دێ و لە ژووری خانوودا هیچ بەلایەک تووش نابێ، بەڵکوو لە رۆچنە و ستاتی و سەربانەوە کێشە پێک دێ. نابێ ئەم پەیڤانە بە سووک بزانرێن. بێ هۆ نابێ دڕدۆنگ بێ و پەلپ و بیانووی نابەجێ بگرێ و دەمارگری لە رادە بەدەرکا و لە هەمووشت خانووگومان بێ.

پێغەمبەر و یارانی شەو درەنگان بوو کە لە سەفەرێکی دوور و درێژدا گەڕانەوە. فەرمووی: «کەس لە پرونەکاو نەڕواتەوە ماڵی خۆی؛ راوەستن تا بەیانی برۆنەوە». دووکەس بە ئاوەژووی ئەم بڕیارە بزووتنەوە: هەر یەک لە ماڵی خۆیدا کارێکی نەگونجاوی بینی.

عەلی دەڵێ: «دەگەڵ ژنانوودا زۆر بە دەمار و غیرەت مەبن، چونکە لە نێو خەڵکیدا ناویان دەزڕێ».

غیرەت ئەوەیە کە رێگای دیتنی نامەحرەم بەربەست بکرێ. پێغەمبەر بە فاتمەی فەرموو: «چ شتێ بۆ ژنان چاترە؟» گوتی: «ئەوەی کە نە پیاوی نامەحرەم بیانبینێ، نە پیاوی نامەحرەم ببینن». پێغەمبەر گەلێک بەم پەیڤە شاد بوو و فاتمەی دەکۆش گرت و فەرمووی ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ[1].

مەعاز، چونکە ژنەکەی لە دەلاقەوە روانیە دەر، لێی دا. هەروەها کە خێزانەکەی لەتێ لە سێوێکی خوارد و ئەویتری دایە کۆیلەکەی، دیسان لێیدا.

عومەر دەیگوت: «بەرگی جوان و رازاوە بۆ ئافرەتەکانتان مەکەن، چونکە ئەگەر جلکی نوێ دەبەرکەن پاپای چوونەدەریان دەکەوێتە سەر». لە سەردەمی پێغەمبەردا، وا باو بوو کە ژنان بەرگی رەساو پەسایان لەبەر دەکرد و لە ریزی دوایینی جەماعەتدا رادەوەستان لە مزگەفتدا. لە سەردەمی

---

١. قورئان (٣٤/٣) هەموو لا هەر سەر بەیەکن. (هـ)

سەحابەدا بەرگرییان لێکرد. عایشە گوتی: «ئەگەر پێغەمبەر ئەمڕۆ ژنانی دیبا کە هەڵس و کەوتیان چۆنە، نەیدەهێلا بڕۆنە مزگەوت». ئەمڕۆ بەرگری لە ڕۆیشتنی ئافرەتان بۆ مزگەوت و کۆڕ و کۆ بوونەوەکان چاترە. مەگین پیرێژنێ کە عابایەکی کۆنە لەبەر کار و هیچ کویی دیار نەبێ. زیانی زۆربەی ژنان لە ڕوانین و بەشداری کردن لە کۆڕو کۆبوونەوە دایە.

هەر شوێنێک کە مەترسی تووش بوون بە گوناحی تێدابێ، ڕەوا نییە ژن پێیدا ڕابوێرێ. هەروەها ژن دەبێ ئاگاداری ڕوانینی بێ. جارێ پیاوێکی کوێر ڕۆیشتە مالی پێغەمبەر و عایشە و ژنێکیتر دانیشتبوون، ڕانەبوون و گوتیان: «کوێرە، نابینێ». پێغەمبەر فەرمووی. «ئەگەر ئەو نابینێ، خۆ ئەنگۆ دەبینن».

**شەشەم** – ئەوەیە کە لە خەرجدا میانەڕەو بێ، نە دەس قووچاو. ئەوەش بزانێ دابینکردنی بژیو بۆ خاو و خێزان لە سەدەقەدان هێژاتر و بە نرخترە. پێغەمبەر دەڵێ: «لە نێوان پارەیەک کە لە خەزادا خەرج دەکرێ و پارەیەک کە کویلەیەکی پێ ڕزگار دەبێ و پارەیەک کە بە هەژارێ دەدرێ و پارەیەک کە دەدرێتە بژیو بۆ خێزان، هێژاترین و بە نرخترینیان ئەو پارەیە کە دەدرێتە خێزان».

نابێ بە تەنیا هیچ خواردنێکی چاک و خۆش بخوا. ئەگەر ویستی بە تەنیا بیخوا، کەس پێی نەزانێ. خواردنێ کە نایهێنێتەوە بۆ خێزانی، با هیچ باسی لە لایان نەکا.

ئیبنی سیرین دەڵێ: «چاتر وایە پیاو لە حەوتەدا جارێ هەڵوا یان شیرینیات سازکا، چونکە بە یەکجاری دەس لە شیرینی هەڵگرتن شیاو نییە».

بۆ خواردن دەبێ دەگەڵ بنەماڵەدا پێکرا لە سەرخوانێک دانیشن، ئەگەر میوانیان نەبێ؛ چونکە لە خەبەردا واهاتووە کە: خودای دلۆڤان و فریشتەکان سلاو و دەنێرنە سەر خێزانێک کە پێکڕا لەسەر خوان دادەنیشن».

سەرەکیترین بنەمای بژیو و نەفەقەدان بە خێزان، ئەوەیە کە خەرجیان لە مالی حەلال بۆ دابین کا و هیچ زوڵم و ئەستەمێ پتر لەوە نییە مێرد بژیوی خێزانی لە مالی حەرام دابین کا و بە حەرام ڕایانبێنێ.

**حەوتەم** – ئەوەی پێویستی ژنانە لە مەڕ زانستی دین، نوێژ، تارەت و مەهک و... پێی فێرکا. ئەگەر فێری نەکرد، ژن لە سەری پێویستە بڕواتە دەر و لە زانایەک بپرسێ. کە مێرد زانی، ژن بۆی نییە بەبێپرس و ڕای پیاوەکەی بڕوا لە کەسیتر پرسیار کا. ئەگەر پیاو لەم کارەدا کورتی کرد، گوناحبارە؛

چونکە خودا فەرمووی: قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارًا[1] واتە، خۆتان و خێزانتان لە ئاگر بپارێزن.

بەم رادەیە دەبێ فێر بێ کە گەر پێش ئاوا بوونی خۆر لە نەخۆشی ژنانە پاکژ بۆوە، دەبێ نوێژی نیوەڕۆ و عەسەر بە قەزا بگێڕێتەوە. ئەگەر پێش هەلاتنی رۆژ پاقژ بۆوە، دەبێ نوێژی شێوان و خەوتن بگێرێتەوە. زۆربەی ژنان ئەمە نازانن.

**هەشتەم** – ئەگەر پیاوێ دوو ژنی هەیە، لە نێوانیاندا دادوەرانە بجوولێتەوە، چونکە لە خەبەردا هاتووە کە: «هەرکەس سەرنجی زۆرتر بداتە یەک لە ژنەکانی، رۆژی پەسلان نیوەیەکی کووژ دەبێ». وەکوو یەک دیارییان بداتێ و شەو لە لایان بنوێ. بەلام لە دۆستایەتی و ئاخافتندا مەرج نییە وەکوو یەک بن.

پێغەمبەر، هەر شەو دەگەڵ ژنێکی دەنووست، بەلام عایشەی خۆشتر دەویست و دەیگوت: «خوایا! ئەوەی بە دەستی منە، کۆشەوە دەکەم دادوەرانە بێ، بەلام خۆش‌ویستن بە دەستی من نییە».

ئەگەر پیاوێ لە ژنێ تێر بوو و نەیدەویست بڕواتە لای، دەبێ لێی جوودا ببێتەوە و دەبەندیدا نەهێڵێ. پێغەمبەر ویستی سوورەی خێزانی تەلاق بدا و لێی جودا بێتەوە، گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو شەوەی نۆبەی منە، بڕۆرە لای عایشە و لێم جودا مەبەرەوە، تا لە رۆژی پەسلاندا لە ریزی ژنەکانتدا بم». لێی جودا نەبووەوە، بەلام دوو شەو دەرۆیشتە لای عایشە و نەدەرۆیشتە لای سوودە.

**نۆهەم** – ئەگەر ژن لە گفتی شووی لایدا و گوێی پێ نەدا، دەبێ پیاو بە هێمنی و نەرم و نیانی و دلۆڤانیەوە، بیهێنێتەوە سەر رێی راست. ئەگەر نوێژی نەخوێند و رۆژووی نەدەگرت، دەبێ پێخەفی لێ جیا کاتەوە و لە نووستندا پشتێ لێ هەلکا. ئەگەر بەندەگی خودای بەجێ نەدەهێنا، سێ شەو پێخەفی لێ جیا کاتەوە. ئەگەر هیچ قازانجی نەبوو، لێی بدا؛ هەرچەن نابێ بە توندی لێی بدا. ئەگەر لە نوێژ یا خۆ ئەرکی دینیدا کورتی کرد، رەوایە مانگێک یا زۆرتر لێی توورە بێ؛ چونکە پێغەمبەر مانگێک لە ژنەکانی مانی گرت.

**دەهەم** – نزیکی دەگەڵ ئافرەتە. دەبێ روو لە قیبلە وەگێرێ و سەرەتا بە قسە و گەمەو دەستبازی و راموسان دڵی خۆش کا، چونکە پێغەمبەر فەرموویە: «پیاو نابی وەکوو چوار پێ خۆ بەسەر ژنیدا بدا؛ دەبێ بەر لە نزیکی، ناردراو هەبێ». گوتیان: «ئەو نادراوە کێیە؟» فەرمووی «ماچ».

لە سەرەتای نزیکی کردندا بلێ «بِسۡمِ اللهِ الۡعَلِيِّ الۡعَظِيم: اَللهُ اَكۡبَر. اَللهُ اَكۡبَر. اَللهُ اَكۡبَر». هەروەها ئەگەر

---

[1] - قورئان، ٦٦/٦.

سەرەتا «قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ» بخوێنیێ چاترە. پاشان بڵێ «اَللّٰهُمَ جَنِّبْنا الشّیطانَ وَجَنِّبِ الشیطانَ مِمّا رُزِقنا»[1] لە خەبەردا وا هاتووە کە هەرکەس ئەمە بڵێ و منداڵێکیان بێ، ئەو منداڵە لە شەیتان بەدوورە.

لە کاتی کاژێر[2]دا بە دڵ بڵێ « (الحمد لله) ٱلَّذِی خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا»[3]. پاش کاژێر بوون، پەلە نەکا تا ژنەکەشی زاڤێر[4] بێ، چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «سێ شت لە لاوازی پیاوە: یەکەم ئەوەی کەسێکی خۆش بوێ و بەر لە لێکدابڕان ناوی نەپرسێ؛ دووهەم هەڤاڵێکی چاکەی دەگەڵ کاو ئەو دەست بەڕوویەوە بنێ؛ سێیەم بەر لە ماچ و گەمەو دەسبازی، دەگەڵ خێزانی نزیکی کاو پاش ئەوەی نیازی دڵی وەرگرت، ڕانەوەستێ تا ژنەکەش ئارام بگرێ».

لە عەلی و مەعاویە و بووهورەیرە گێڕدراوەتەوە کە نزیکی لە سەرەتا و ناوەند و دوایی مانگدا مەکرووهە؛ چونکە شەیتانەکان لەم شەوەدا دێن بۆ روانین. هەروەها پیاو نابێ لە کاتی مەهکدا توخنی ژنی کەوێ. بەڵام دەتوانن بە رووتی پێکەوە بنوون. هەروەها بەر لە غوسڵی مەهکیش نابێ نزیکی کەن. ئەگەر جارێک نزیکی کرد، بۆ جاری دووەم دەبێ خۆی بشوا. ئەگەر بەلەش پیسیەوە ویستی شتێک بخوا، دەبێ دەست و دەم و پێ و شەرمگای بشوا، ئەگەر ویستی بنوێ، دەسنوێژ بگرێ، هەر چەندە لەشیشی پیس بێ، چونکە سوننەت وایە.

بەر لە خۆشوردن لە کاتی لەش پیسیدا موو و نینۆکی کورت نەکاتەوە. باشتر ئەوەیە لە کاتی نزیکیدا، بهێڵێ تا ئاو بگاتە پزدانی ژن و خۆ نەکێشێتەوە؛ ئەگەر خۆی کێشاوەو نەیهێشت ئاو بگاتە رەحەمی، حەرام نییە.

یەکێک لە پێغەمبەری پرسی: «کارەکەرێکم هەیە کە نامەوێ زگی پڕ بێ و پەکی کارەکانی بکەوێ».گوتی: «خۆ بکێشەوە، چونکە ئەگەر لە چارەتدا نووسرابێ، خۆی دێتە دی». پاش ئەوە هات و گوتی: «منالمان بووە». جابر گوتی «کنّا نَعْزِنُ والقُرانُ ینْزِلُ»؛ ئێمە خۆمان دەکێشایەوە، وەحی دەهات و لەم کارە نەهی نەدەکردین.

**یازدەهەم** – هاتنە دونیای منداڵە. کە منداڵ هاتە دونیا، دەبێ بە گوێی راستیدا بانگ بدەی و بە گوێی چەپیدا قامەتی نوێژ بخوێنی. لە خەبەردا واهاتووە کە «هەرکەس وای کرد زاڕۆلەکەی لە

---

[1] - خوایا! لە شەیتانمان دوور کەرەوە و شەیتانیش لەوەی کردۆتە بەشمان دوور خەوە.

[2] - کاژێر: انزال.

[3] - (قورئان، ۲۵/۵٤)

[4] - زاڤێر: ژنێ کە لە پیوەندی لە گەڵ مێردەکەی رەحەت بێ.

تەخۆشی منداڵانە دەپارێزرێ».

ناوی جوانی لەسەر بنێ. لە هەواڵدا هاتووە کە هێژاترین ناو لە لای پەروەردگاری مەزن، «عبدالله» و «عبدالرحمن» و وەک ئەوانەیە. منداڵ کە لە زکی داکیدا لەبار چوو، سوننەت وایە کە ناوی بنێن.

قوربانی حەوتانەی منداڵ، سوننەتی موئەککەدەیە: بۆ کچ مەڕێک و بۆ کوڕ دوو مەڕ (ئەگەر یەک مەڕیش بێ هەر دەبێ). عایشە گوتوویە «ئێسقانی قوربانی حەوتانەی منداڵ نابێ بشکێندرێ.

سوننەت وایە کە منداڵ هاتە دونیا، لێوی شیرین کەن و لە رۆژی حەوتمدا مووی بتاشرێ و هاوسەنگی مووەکە زێر یان زیو بداتە خێر.

نابێ لە هاتنە دونیای کچ بێزار بێ و بە کوڕ گەشکە بێ؛ چونکە نازانێ خێر و چاکەی لە کامدایە. کچ پیرۆزترە و پاداشی زۆرترە. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس سێ کچ یان سێ خوشکی بێ و باری ژیانیان بخاتە ئەستۆی خۆ، لە سۆنگەی ئەو بەزەیی و دلۆڤانییەوە، خودا بەزەیی پێدا دێ و دەرووی رەحمەتی بۆ دەکاتەوە». یەکێک پرسی: «ئەی ناردراوی خودا! ئەگەر دوو بن؟» گوتی: «ئەگەر دووش هەبێ هەر وایە». یەکێک‌تر پرسی «ئەگەر یەکێک بێ؟» فەرمووی : «یەکیش بێ هەروا». هەروەها پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس کچێکی هەبێ رەنج لە کۆڵە، هەرکەس دوو کچی بێ، بارگرانە و هەرکەس سێ کچی بێ، ئەی موسوڵمانان! یاریدەی بدەن چونکە لە بەهەشتدا ئێمە وەکوو دوو قامکی شادەو گەورە پێکەوەین».

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس لە بازاڕ نۆبەرێ بکڕێ و بیهێنێتەوە بۆ ماڵ، وەکوو ئەوەیە سەدەقەی دابێ. هەروەها دەبێ سەرەتا بە کچەکەی بدا، پاشان بە کوڕەکەی، چونکە ئەوەی کچێک شادکا، وەکوو ئەوەیە لە ترسی خودا گریابێ؛ ئەوەش لەبەر ترس لە خودا گریابێ، لەشی لە ئاور حەرامە».

**دوازدەهەم** — تابکرێ ژن تەلاق نەدرێ؛ چونکە پەروەردگار لە نێو موباحەکاندا گەلێک تەلاق بە دوژمن دەزانێ. بە گشتی دڵ ئێشاندنی کەس رەوا نییە، مەگین پێویست بێ.

ئەگەر نیاز بە تەلاق خستن بوو، نابێ زۆرتر لە یەکێکیان بخا، چونکە بە جارێ سێ تەلاقە کردن، مەکرووهە. لە کاتی نەخۆشی ژنانەشدا تەلاق دان حەرامە. هەروەها پاش نزیکی کردنیش تەلاق دان حەرامە.

بۆ تەلاق دان، دەبێ بە رووی کراوە و دلۆڤانیەوە بیانوویەک بۆ تەلاق بێنێتەوەو بە تووڕەیی و سووکییەوە ژن تەلاق نەدا؛ دیارییەکی پێ بدا و دڵی خۆش کا؛ نهێنیەکانی بە لای کەسەوە نەکاتەوە هوی لێکدابڕانیان بە کەس نەڵێ. لە یەکێکیان پرسی: «بۆچی لە ژنەکەت جیا دەبیەوە؟» گوتی:

«نهێنی خێزانی خۆم ئاشکرا ناکەم». یەکێک ژنەکەی تەلاق دا و لێیان پرسی: «بۆچ تەلاقت دا؟» گوتی: «من چ کارێکم بە ژنی خەلکەوە هەیە کە باسی بکەم».

## مافی مێرد بە سەر ژندا

ئەمەی هاتە گوتن، مافی ژن بوو بەسەر پیاودا، بەڵام مافی پیاو زۆرترە؛ چونکوو لە راستیدا پیاو خێوی ژنە. ئەگەر کرنۆش بردن بۆ بێجگە لە خودا، رەوا بوایە، دەبوایە ژنان کرنۆش بەرنە بەر پیاوانیان.

مافی پیاو بەسەر ژندا ئەوەیە کە ژن، لە ماڵ دابنیشێ و بە بێ ئیزنی ئەو نەرواتە دەر، نەرواتە سەربان و بەر دەرگە، دەگەڵ جیرانان زۆر تێکەڵ نەبێ و قسەی کەم کا و بە بێ هۆ نەرواتە لایان؛ بە چاکە باسی مێردەکەی کا، نهێنیەکانی پێوەندی ژن و مێردی بە کەس نەڵێ، لە کارەکانیدا چاوی لە رەزا و شادی مێردی بێ، دەگەڵی دلۆڤان بێ، کە دۆستی مێردەکەی لە دەرکەی دا، وای پەرسڤ بداتەوە، وەکوو ئەوەی نایناسێ، لە هەموو خزمانی مێردەکەی خۆی بپۆشێ تاکوو نەیبینن. بەوەی مێردەکەی هەیەتی دڵخۆش و قانع بێ و داوای فرەتر نەکا. مافی مێرد لە مافی خزمان جوێ کاتەوە، هەموو کات خۆی پاکژ و خاوێن کا، بە چەشنێ کە شیاوی نزیکی بێ. ئەوەی بە خۆی دەکرێ، خۆی جێبەجێ کا. بە هۆی جوانییەوە خۆی بەسەر مێردەکەیدا هەڵنەکێشێ. بە چاکەکانی بزانێ و سپڵە نەبێ و نەڵێ چ چاکەیەکم لێت دیوە و بێ هۆ بە دوای دینەوەی کەمایەسی مێردەکەی نەبێ و توند نەبێ و داوای کرین و فرۆتن و تەلاق نەکا؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «سەیری دۆژەهم کرد، زۆربەیان ژن بوون، گوتم بۆ وایە. گوتیان :پلاری زۆر لە مێردیان دەگرن و زۆر لە مێردیان ناسپاسن».

## بنه مای سێهه م- نه ریته کانی کار و بازرگانی

دونیا مەنزڵگایەکە بۆ دابینی زادی دوارۆژ و مرۆ پێویستی بە خۆراک و پۆشەن هەیە و ئەوەش بێ کار و کاسبی پێک نایێ؛ بۆیە پێویستە نەریتەکانی بزانرێ. ئەوەی نووک و بەدی خۆی بۆ کاری دونیا تەرخان کا، چارەڕەش و زیانبارە و ئەوەی بە تەواوی دڵ و گیانی بۆ ژینی هەرمان و بێ پایانی ڕۆژی پەسلان تەرخان کا، سپیبەختە. بەڵام چاتر وایە کە مرۆڤ هەم بپەرژێتە سەرکاری دونیا و هەم دوارۆژ. هەرچەندە دەبێ بیر و هۆشی لە لای دوارۆژ بێ و دونیای بۆ دابینی بژیوی ڕێی دوارۆژ بوێ.

ئەوەی کە پێویستە لە مەڕ دەستوور و نەریتی کار و کاسبی بزانرێ، لە پێنج بەشدا باس دەکرێ.

**بەشی یەکەم** – خێر و دەمی کار و کەسبی حەڵاڵ،

**بەشی دووەم** – مەرجەکانی مامەڵە کردن،

**بەشی سێهەم** – پەیڤین لەسەر بە ویژدان بوون لە مامەڵەدا،

**بەشی چوارەم** – چاکە کارییەک کە سەرتر لە ویژدان بێ،

**بەشی پێنجەم** – میهرەبانی و دڵسۆزی بازرگان دەگەڵ دینی خوی.

### به شی یه که م- په یڤین له سه ر خێر و ودمی مامه ڵه ی حه لاڵ

بزانە بێ نیازکردنی خۆت و بنەماڵەت و بە دەست هێنانی ماڵی خاوێن و حەڵاڵ، لە ریزی خەبات لە ڕێی دینەو لە زۆربەی عیبادەتەکان هێژاترە. جارێک پێغەمبەر و یارانی دانیشتبوون، گەنجێکی بە شان و باهۆ، بەرەبەیان لە تەنشتیاندا تێپەڕی؛ هەموویان گوتیان: «مخابن! بریا ئەم زوو لە خەو هەستانەی بۆ کۆشەوە لە ڕێی خودا بایە». پێغەمبەر فەرمووی: «قەد وا مەڵێن؛ چونکوو ئەگەر هۆی هەستانی بێ نیازکردنی داک و باب و ژن و منداڵیە لە خەڵکی، ئەو هەستانە لە ڕێی خودایە. کەچی ئەگەر ئەو هەستانەی بۆ فیز و دەمار و لەخۆبایی بوون بە دونیایە، لە ڕێی شەیتانە».

پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی خەریکی کاری دونیا بێ تا لە خەڵکی بێنیاز بێ و لەگەڵ دراوسێ و

کریڤانیدا رووگەش و لێو بەبزە بێ، رۆژی پەسلان روومەتی وەک هێڤی چاردە دەدرەوشێتەوە». دیسان فەرمووی: «بازرگانی راسبێژ رۆژی پەسلان دەگەڵ چاکان و شەهیدان رادەبێ». هەروەها گوتی: «پەروەندەم پیشەسازی برواداری خۆش دەوێ». دیسان فەرمووی: «حەلاڵترین و پاکژترین شت، کاری پیشەسازێکە کە خۆی لە خراپە و حەرام ببوێرێ». هەروەها گوتی: «بازرگانی کەن، چونکە رۆژی نۆ کەس لە دە کەس لە مامەڵەدایە». دیسان فەرمووی: «ئەوەی دەرکی دەرۆزەیی بەسەر خۆدا بکاتەوە، پەروەردگار حەفتا دەرکی بەلەنگازی بە سەردا دەکاتەوە».

عیسا زەلامێکی دی و لێی پرسی: «کارت چییە؟» گوتی: «عیبادەت دەکەم». گوتی: «خواردن لە کوێڕا دێنی؟» گوتی: «هەڤاڵێکم هەیە ئەو یارمەتیم دەدا». عیسا گوتی: «کەواتە، هەڤاڵەکەت لە تۆ زۆرتر عیبادەت دەکا».

عومەر گوتی: «دەست لە کار هەڵمەگرن و بڵێن خودای دلۆڤان دەهندەیە، خوا لە ئاسمانەوە زێڕ و زیو نابارێنێ».

لوقمانی زانا قەوینتی بۆ فرزەندی کرد و گوتی: «خەریکی کار و کاسبی بە، چونکە ئەوەی بەلەنگاز و نەدار کەوت و دەستی بۆ خەڵکی راکێشا، دینی سست دەبێ و ئاوەزی لاواز دەبێ و مێرخاسی لە لای نامۆ دەبێ و خەڵکی بە سووکی سەیری دەکەن».

پرسیاریان کرد لە یەکێک لە گەورەکان کە: عابید هێژاترە یا بازرگانی دەست پاک؟» گوتی: «بازرگانی دەست پاک؛ چونکە لە رێی سەنگ و ترازووەوە بەرەنگاری شەیتان دەکا و بە ئاوەژووی ویستی ئەو دەبزوێتەوە». عومەر دەڵێ: «مردن لە هیچ کوێ پتر لەوەی لێم جوان نییە کە لە بازاڕ بم و خەریکی کار و کەسبی حەلاڵ».

لە ئەحمەدی حەنبەلیان پرسی: «رات سەبارەت بەو پیاوەی لە مزگەفتدا دادەنیشێ و خەریکی پەرستنی خودایە و دەڵێ خودا رۆژیم بۆ دەنێرێ چییە؟» گوتی: «ئەو زەلامە ساویلکەیە و لە شەرع نەگەیوە؛ چونکە پێغەمبەر فەرموویە : پەروەرندەم رۆژی منی لە سای رمبەکەمدا داناوە». واتە خەزا کردن.

ئەوزاعی، ئیبراهیمی ئەدهەمی بینی کە کۆڵە هێزمێکی لە کۆڵ ناوە، گوتی: «تۆ کە برادەرانت پێیان خۆشە بژیوت دابین کەن بۆ خۆت لەم ئازارە دەربازە ناکەی؟» گوتی: «لە خەبەردا واهاتووە کە «ئەوەی بۆ بژیوی حەلاڵ خۆی بخاتە ئازار، پەروەرندەم بەهەشتی پێ فەرز دەکا».

**پرسیار**: ئەگەر کەسێک بڵێ، پێغەمبەر گوتوویە«مَا اوُحی الَیَّ اَن اجْمَعِ المالِ وکُنْ مِن التّاجِرین ولَکنْ اوُحی الِیَّ اَنْ سَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّکَ وکُنْ مِنَ السّاجِدینَ وَاَعْبُدْ رَبَّکَ حَتّی یاتیکَ الْیقینُ»؛ واتە پێیان نەگوتم کە خەریکی کار و کۆوەکردنی سامان بە، بەڵکوو گوتیان خەریکی کڕنۆش بردن بەو هەموو تەمەنت

خەریکی بەندەگی پەروەرندەت بە. کەواتە، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە بەندەگی و عیبادەت، لە کار و کەسب هێژاترە.

**پەرسڤ** – دەبێ بزانی کە هەرکەس دابین‌کردنی بژیوی خۆی و خێزانی لە ئەستۆی خۆیە. بێ گومان بۆ ئەم کەسە بەندەگی خودا هێژاتر لە کارو کەسبە، چونکە ئەوەی زۆرتر لە نیازی بپەرژێتە سەر کار، هیچ هێژاییەک لەو کارەدا نییە؛ تەنانەت دڵ دەخاتە بەندی دونیا و زیان لە دینی خۆی دەدات؛ ئەمەش لە سەرووی هەموو گوناحانە، ئەوەش بۆ خۆی ماڵ‌وسامانی نەبێ بەڵام بتوانێ بە ماڵی ئەوقاف بژیوی ژینی دابین‌کا، کار نەکردنی چاترە؛ ئەوەش بۆ ئەم چوار کەسەیە:

کەسێک کە خەریکی فێر بوونی زانستێ بێ کە قازانجی یان بۆ دینی بێ -وەکوو زانستی شەریعەت- یا دونیایی بێ وەکوو زانستی پزیشکی؛

کەسێک کە کاری کۆ کردنەوەو دابەش‌کردنی ماڵی ئەوقاف و سەدەقەی خەڵکی بێ؛

یا ئەو کەسەی لە دڵدا ڕۆچنەیەکی داکردبێ بۆ نێو دونیای حاڵ و دۆخی سۆفییانە؛

یا خۆ ئەو کەسەی کە لە خانەگایەکی وەقف کراودا، خەریکی یاد و زیکر و چاودێری بەسەر دڵی خۆیدا بێ.

ئەم کەسانە کار و کەسب نەکردنیان بۆ چاترە.

ئەگەر بژیوی ئەم کەسانە دەمێک بێ کە بە هۆی خێر و سەدەقەی خەڵکەوە دابین بکرێ و خەڵکی بێ هیچ مننەت و چاوەڕوانیەک پێیان خۆش بێ سەدەقە بەم کەسانە بدەن و پێویست بە دەرۆزەیی و دەست ڕاکێشان لە پێش خەڵک نەکا، کارنەکردن لە پێشترە. لە گەورەکان کەسی وابووە کە سیسەت‌وشەست برادەری بووە و هەر شەوە میوانی یەکیان بووە و لەم سۆنگەوە خەریکی عیبادەت بووە و قەد کاری نەکردووە. ئەم کەسانە هۆکارێکن بۆ ئەو کەسانەی داران و خەریکی کاری دونیان و پێیان خۆشە سەدەقە و خێر لە ڕێی خوادا بدەن. بەڵام ئەگەر ڕۆژگار وابوو کە خەڵکی بەبێ‌دەرۆزەیی چاکەیان دەگەڵ کەس نەدەکرد، کار کردن پێویستە و دەرۆزەیی گوناحێکی هەرە گەورەیە و تەنیا لە هەڵومەرجی تایبەتدا حەلاڵ دەبێ. مەگین ئەوەی کەسێک ئاستی زانستی گەلێک بەرز بێ و قازانجی زۆر و زەوەند بێ و سووکی داوای بژیوکردنی بۆ زۆر بچووک بێ؛ دەڵێین ئاوەها کەسێک کار نەکردنی هێژاترە.

بەڵام ئەوەی تەنیا بە ڕواڵەت خەریکی عیبادەتە و دڵی لە یادی خودا بۆشە، کارکردنی بۆ پێویستە. چونکە هۆی هەموو عیبادەتێک زیکر و یادی خودایە و لە نێو کاریشدا دەکرێ دڵ لە یادی خودادا بێ.

## بەشی دووەم باس لە زانستی کار و کەسب تا بە گوێرەی مەرجەکانی شەرع بێ

ئەم بەشە دوور و درێژە و بە گشتی لە کتێبی فیقهدا بێژراوە. بەڵام لەم کتێبەدا ئەوەی پێویست بێ دێتە گوتن، هەرکەس ئەمانەی زانی و پرسێکی بۆ هاتە گۆڕێ دەتوانێ پرسیارکا؛ هەرکەسیش ئەوی نەزانی، تووشی حەرام و سوو دێ و نازانێ کە دەبێ ئەمانە بپرسێ.

زۆربەی کەسبەکان شەش جۆرن: بەیع، سوو، سەلەم، کرێ، قەرز و هاوبەشی. کەواتە سەرجەمی مەرجەکانی ئەم پەیمانانە دەڵێین.

**پەیمانی یەکەم بەیعە**. زانینی زانستی بەیع بەجێ هێنانی فەرزە و کەس لەم فەرزە بەری نییە. عومەر دەڕۆیشتە نێو بازاڕ و قەمچی رادەشەکاند و دەیگوت: «کەس بۆی نییە بێتە نێو بازاڕ و کاسبی کا، مەگین ئەوەی پێشتر زانستی فیقهی بەیع فێر بووبێ، ئەگینا تووشی سوو دێ؛ چ خۆی پێی خۆش بێ یا نە».

ئەستوونی بەیع سێیانن: **یەکەم** کڕیار و فرۆشیار، کە پێیان دەڵێن گرێدەر[1]، دووهەم کۆتاڵ و کالایە کە پێی دەڵێن بابەت[2]، سێهەم پەیڤی بەیع.

**ئەستوونی یەکەم**، گرێدەرە. بازاڕی دەبێ دەگەڵ پێنج کەس مامەڵە نەکا: منداڵ و شێت و کۆیلە و کوێر و حەرامخۆر.

منداڵی پێنەگەیو، بە گوێرەی بۆچوونی شافعی، هەرچەند لە ژێر چاودێری سەرپەرشتدا بێ، مامەڵە لەگەڵی نابەجێیە. شێتیش هەروایە. هەرچی بەم کەسانەی داو فەوتا، لە ئەستۆی خۆیە. هەرشتەکیش ئەوان پێیان داو زیانی هێنا، دیسان لە ئەستۆی ئەمە. کۆیلەی ژیریش بە بێ ئیزنی خودانی خۆی کڕین و فرۆتن دەگەڵی ڕەوا نییە و قەساو و نانکەرو دووکاندار نابێ لە مامەڵەی لە گەڵ کەن، مەگەر ئەوەی کە بە گوێی خۆیان لە خودانی ئەو کۆیلەیە ببیسن، یاخۆ کەسێکی دادوەر و ناودار و جێی متمانە پێیان بڵێ کە بیستوویە، یاخۆ لە نێو باژێردا بەناوبانگ بێ کە ئیزنی پێ دراوە. کەواتە بۆی نییە بە بێ ئیزن شتەکی لێ بستێنێ؛ ئەگەر سەندی تاوانی کردووە؛ هەروەها ئەگەر شتێکی پێ فرۆت، بۆی نییە داوای زیان کا لە خودانی کۆیلە، تا ئەو کاتەی ئەو کۆیلەیە رزگار دەبێ.

مامەڵە دەگەڵ کوێریش بەتاڵە؛ مەگین ئەوەی بریکارێکی بینای بێ. بەڵام ئەوەی بیستێنێ، ئۆباڵی وە ئەستۆی خۆیە (واتە، کوێر)، چونکە سەربەست و ئازادە.

---

[1] - گرێدەر: عاقد.

[2] - بابەت: معقود علیه.

دەگەڵ حەرامخۆران (وەکوو ترک و زاڵم و جەردە و سووخۆر و شەراو فرۆش و لوتی و پەسن‌بێژی خونکاران و شایەتی‌دەربەدرۆ و بەرتیل‌خۆر) مامەڵە رەوا نییە. ئەگەر لەگەڵیان مامەڵەی کرد و ئارخەیان بوو کە ئەوەی کڕیویە، ماڵی خۆیانە و حەرام نییە، دروستە؛ بەڵام ئەگەر بزانێ کە بە راستی هی خۆی نییە، ئەو مامەڵەیە پووچەڵە. ئەگەر لەو کاڵایەی کە دەیکڕێ دڕدۆنگ بوو و لێی ورد بۆوە و تێگەیشت کە زۆربەی حەڵاڵە و حەرامی کەمە، جا ئەو مامەڵەیە دروستە، بەڵام گومان و لێڵی لە حەرام بوونی ناسڕێتەوە؛ بەڵام ئەگەر حەرامی پتر لە حەڵاڵ بوو، لە رواڵەتدا ناکرێ بڵێن بەتاڵە، کەچی لێڵی و گومانێکی لە سەرە کە لە حەرامی نزیک دەکاتەوە و مەترسییەکی ئێجگار گەورەیە.

مامەڵە لەگەڵ جوولەکە و مەسیحی دروستە؛ بەڵام نابێ کتێب و کۆیلەی موسوڵمانان پێیان بفرۆشرێ؛ هەروەها ئەگەر خەریکی شەڕ لەگەڵ موسوڵمانانن، نابێ چەکیان پێ بفرۆشرێ؛ چونکە ئەم مامەڵەیە لە رواڵەتی مەزهەبدا پووچەڵ و بەتاڵە و دەبێتە هۆی سەربزیو بوونی دوژمن.

ئەو کەسانەی کە رابواردن دەگەڵ ژنانی نامەحرەم و خواردنەوەی شەراویان لەلا رەوایە، مامەڵە دەگەڵیان حەرامە و بە لەدین‌دەرچوو دێنە هەژمار.

**ئەستوونی دووەم** ماڵ و کۆتاڵە کە مامەڵەی پێ دەکرێ و بۆ ئەم مەبەستە، دەبێ شەش مەرج لەبەرچاو بێ:

**مەرجی یەکەم** — نابێ پیس بێ؛ چونکە سەگ و بەراز و سەنێر و ئێسقان و مەی و گۆشتی بەراز و رۆنی مردار لە فرۆتن نایەن. بەڵام رۆنی پاک و خاوێن کە شتێکی ناپاکی تێکەوێ، فرۆتنی حەرام نییە؛ جلکی پیسیش هەروایە. بەڵام ناوکی مسک و تووی کرمی ئاوریشم فرۆتنی حەڵاڵە، چونکە لە راستیدا ئەم دووانە پاکن.

**مەرجی دووەم**- چونکە مەبەست لە مامەڵە قازانج و خێرە، دەبێ ئەو شتەش کە مامەڵە دەکرێ خێر و قازانجی بێ. بویە مامەڵەی مار و مشک و دووپشک و قۆلانچە بەتاڵە. قازانجێ کە لە چزووی مارایە، هیچ بنەمایەکی نییە. فرۆتنی شتێکی وەکوو دانەیەک توو، کە نەختێکی هیچ کەڵکی نییە. دروست نییە و بەتاڵە.

فرۆتنی پشیلە و مێش‌هەنگوێن و پڵەنگ و شێر و گورگ و ئەو گیاندارانەی کە لە پێست و گۆشتیاندا قازانج هەیە، رەوایە. کڕین و فرۆتنی تاوس و ئەو مەلانەی کە قازانجیان لە جوانیاندایە، رەوایە؛ فرۆتنی ساز و سەمتوور و تار و رەباب، حەرامە.

ئەو پەیکەرانەی کە لە قوڕ چێ دەکرێن تا منداڵان یارییان پێ بکەن، ئەوانەی لە بیچمی گیانداران بن، فرۆتن و کڕینیان حەرامە و پارەکەشی حەرامە و شکاندنی پێویستە؛ بەڵام لە بیچمی دار و

روەکدا بێ رەوایە. جام و دەفر و کۆتاڵ و پارچەیەک کە وێنەی لەسەر کێشرابێ، مامەڵەی دروستە و رایەخ و سەرین و پێخەفێ کە پێی چێ دەکرێ، لەبەرکردنی رەوایە.

**مەرجی سێهەم** – دەبێ خودانی ماڵەکە فرۆشەری ماڵەکە بێ: ئەوەی ماڵی کەسێکیتر بفرۆشێ، ئەو ماڵە لە فرۆتن نایە و فرۆتنی رەوا نییە؛ چونکە ئیزن دەبێ پێش لە فرۆتن بدرێ.

**مەرجی چوارەم** – شتی فرۆشراو دەبێ بکرێ بدرێتە کڕیار: فرۆشتنی کۆیلەی هەڵاتوو، ماسی لە گۆمدا، مەل لە ئاسمان، منداڵ لە زگی مایین و ئاو لە پشتی ئەسپی نێر، رەوانییە؛ چونکە ئەمانە هەموویان ناکرێن پاش فرۆتن بدرێنە کڕیار. پەشم و شیری نێو مەمکی ئاژەڵیش لە فرۆتن نایە، چونکە تا بیدۆشێ و بیداتە کڕیار، دەگەڵ شیری نوێ تێکەڵ دەبێ. فرۆتنی بارمتە، بەبێئیزنی خێوەکەی حەرامە. فرۆتنی کارەکەرێک کە بووبێتە دایکیش هەر حەرامە. فرۆتنی منداڵی ساوا بەبێدایکی حەرامە (منداڵێ کە دایکی کۆیلە بێ)؛ چونکە لێک هەڵاواردنیان حەرامە.

**مەرجی پێنجەم** – دەبێ رادە و دانستە و جۆری کاڵا دیاری بکرێ. نەزانینی تەواو ئەوەیە کە بڵێ: «مەڕێک لەم گەلە، یاخۆ بەشێک لەم چاوگە بە کەیفی خۆت پێت دەفرۆشم». بەڵکوو دەبێ جیای کاتەوەو ئاماژی پێ کا و بیفرۆشێ. ئەگەر بڵێ «دە گەز لەم زەمینەم پێت فرۆت، لە هەر شوێنێکەوە کە پێت خۆشە ئەوەش بەتاڵە.

بەڵام زانینی رادەی ئەو شتەی کە دەفروشرێ یان بە پێوان، یان هەڵسانگاندن یا روانین بەو شتەدا دیاری دەکرێ. ئەگەر کەسێک بڵێ : «ئەم شتەم پێت فرۆت، بەو پارەی کە فلانکەس جلکی خۆی فرۆت، یاخۆ هاوسەنگی فلان شت زێڕ یا زیو»، هەروەها رادەی ئەو شتە نەزانێ، رەوا نییە. بەڵام ئەگەر بڵێ: «ئەم گەنمەم پێت فرۆت، یا بەم پێوانەیە زێڕ یا زیوم پێت دا» و دیار بێ، رەوایە.

تایبەتمەندی کاڵا بە دیتنی ئەو کاڵایە ئاشکرا دەبێ: ئەگەر کەسێک شتێکی نەدیبێ، یاخۆ دیبێتی کەچی رۆژگارێکی زۆری بەسەردا تێپەڕبێ و لەم ماوەیەدا بە زۆری تووشی گۆڕان هاتبێ، فرۆتنی نارەوایە. فرۆشتنی بەرگی نەدووراو و گەنمی لە هۆشەدا، بە تاڵ و پووچەڵە. لە فرۆتنی کارەکەردا دەبێ کڕیار پرچ و سەر و دەست و پێ و ئەوەی نەریتی کۆیلە فرۆشانە، ببینێ؛ ئەگەر نەیدی فرۆتنی نارەوایە، بەڵام گوێز و هێلکە و هەنار و باقلە، هەرچەن لە پێستدا بن، رەواو بەجێیە. باقلەی تەڕ و گوێزی کەمکۆڵ، فرۆتنیان هەر بەو چەشنە رەوایە.

**مەرجی شەشەم** – هەرچی فرۆشرا تانەنرێتە دەستی کڕیار، نەفرۆشراوە؛ سەرەتا دەبێ بدرێتە کڕیار، پاشان بفرۆشرێ.

**ئەستوونی سێهەم** پەیمان و بڕیارە و دەبێ پەیڤەکەشی ببێژرێ. دەبێ بڵێ: «ئەمەم پێت فرۆت»

ئەویش بڵێ «کڕیم» یا بڵێ «ئەمەم بەو نرخە پێتدا» ئەویش بڵێ «وەرمگرت» یا «کڕیم»، یاخۆ شتێک بڵێ کە ئەم واتایە بە راشکاوی بگەیەنێ. کەواتە، ئەگەر ئەم پەیڤە نەبێژرێ – بەر لە دان و ستان- مامەڵەکە بەتاڵە؛ بەو جۆرەکە ئەمڕۆ باوە. بە بۆ چوونی ئەبووحەنیفە، لە کڕین و فرۆتنی کالای بچووک و کەم بایەخدا، گوتنی ئەم پەیڤە زۆر پێویست نییە، هەندێ لە زانایانی شافعی مەزهەبیش ئەم بۆچوونەیان سەلماندووە و فتوایان لەسەر داوە؛ ئەمەش لە سۆنگەی سێ هۆیە:

**یەکەم** – هەمووان پێویستیان پێیە.

**دووەم** – وادیارە لە سەردەمی یارانی پێغەمبەریشدا ئەم شێوازە باو بووە؛ چونکە ئەگەر گوتنی پەیڤی مامەڵە لە سەریان پێویست بایە، پێیان گران دەبوو و بێ‌شک دەیانگێڕایەوە و شراوە نەبوو.

**سێهەم** – کردە لە جێی قسەدانان –کە بوو بە شتێکی باو- زور نەشیاو نییە؛ هەر وەکوو چۆن لە دیاری داندا دیارە. کە شتێکیان دەبرد بۆ پێغەمبەر و یارانی، ئازاری گوتنی پەیڤیان نەدەدایە خۆ، هەموو دەمیش هەروا بووە. کەوایە، هەر وەکوو چۆن بۆ شتێک کە دانی هەیە و ئەستاندنی نییە(واتە دیاری دان)، خاوەنێتی سەردەگرێ (بە هۆی باو بوون و تەنیا بە کردەوە)، بۆ ئەو شتەش کە ئەستاندنی هەیە (واتە کڕین و فرۆتن) بووز دەخوا؛ بەلام بۆ دیاری دان واباوە کە زۆر سەرنج نادرێتە کەم و زۆر. بەلام لە بەیعدا کە شتێک بایەخدار بوو، واباو بووە کە پەیڤی مامەڵەکەش ببێژرێ: وەکوو خانوو، زەوی، کۆیلە، جلکی پڕبایەخ و چوارپێ. لەم شتانەدا گەر پەیڤی مامەڵە نەبێژرێ، لە نەریتی پێشوونان لای داوە و خاوەنێتی سەرناگرێ.

بۆ نان و گۆشت و میوە و شتی کەم کە بە جیاواز دەیانکڕین، دەرفەتی ئەوە دراوە کە بە گوێرەی نەریتی کڕینی ئەوانە بجووڵنەوە. لە نێوان کەل و پەل و شتی کەم بایەخدا، جیاوازی هەیە، تا بزانرێ ئەم شتە کەم بایەخە یا نە؛ لێک هەلاواردنی ئەمانەش ئەستەمە: بۆیە کە لێک‌هەلاواردنیان دژوار بوو، دەبێ زورتر ئاگەداری بن.

ئەگەر کەسێک خەروارێک گەنم بکڕێ و پەیڤی بەیع نەڵێ، چونکە لە ریزی شتی کەم بایەخ نییە، ئەو کەسە نابێتە خێوی ئەو خەروارە گەنمە؛ بەلام خواردن و دەستێوەردانی حەرام نییە؛ چونکە ئەو شتەی داوەتە دەستی کڕیار و وەرگیراوە، هەرچەند خاوەنێتی سەری نەگرتووە. ئەگەر کەسێک بە میوان کا و لەو خواردنەی پێ بدا، حەلالە.

بەیع بە مەرجێک دروستە کە مەرجی دەگەڵ نەبێ. بۆ وێنە ئەگەر بڵێ «ئەم هێزمەم کڕی بەو مەرجەی بیهێنێتە بەردەرکی ماڵەکەم» یا خۆ «ئەم گەنمەم کڕی بەو مەرجەی بیکەیتە ئارد» یاخۆ «شتێکم بە قەرز پێ بدەی» یا خۆ هەر مەرجێکیتر دابنێ، ئەو مامەڵەیە سەر ناگرێ و پووچەڵ و بەتاڵە، مەگەر ئەم شەش مەرجە کە مامەڵە بە تاڵ ناکەنەوە: یەکێک ئەوەی شتێ بفروشێ بەو

مەرجەی شتێکی لە لا بە بارمتە دابنێ؛ یا خۆ شایەتێک هەڵبژێرێ؛ یا فلان‌کەس بێتە مسۆگەر؛ یا خۆ پارەکەی مۆڵەتدار بێ و خێوەکەی تا کاتێکی دیاریکراو داوای نەکا؛ یاخۆ هەر دووکیان تا سێ ڕۆژ ماوەیان بێ بۆ تێکدان و پاشگەزبوون لە مامەڵە و زۆرتر لە سێ ڕۆژ شیاو نییە؛ یاخۆ کۆیلەیەک بفرۆشێ بەو مەرجەی سەوادی بێ یاخۆ پیشەیەک بزانێ. ئەم مەرجانە بەیع تێک نادەن.

**پەیمانی دووهەم روبایە**. روبا لە پارە و خۆراکدایە

لە مامەڵەی نەختدا دوو شت حەرامە:

**یەکەم** – ڕەوا نییە کە زێڕ بە زێڕ و زیو بە زیو بە قەرز بفرۆشێ، مەگین ئەوەی هەردوویان ئامادە بن و لە هەمان کاتدا دەست بە دەست بن؛ چونکە گەر هەر لەو کۆڕەدا وەرنەگیرێن، مامەڵە پووچەڵ و بەتاڵ دەبێتەوە.

**دووەم**- ئەگەر شتێک بە هەمان شت بە پارەیەکی زۆرتر بفرۆشێ، حەرامە. نابێ دینارێکی درشت بە دینارێکی ورد، زۆرتر لە دینارێک بفرۆشێ و نابێ دینارێکی چاک و نوێ بە زۆرتر لە دینارێک بفرۆشێتە دینارێکی ڕەنگ و ڕوو هەڵپرووکاو، چونکە چاک و خراپ و درشت و ورد هاوسەنگ و بەرانبەرن. بەڵام ئەگەر جلکێک بکڕێتە دینارێک و هەمان جلک بداتەوە بەو کەسەی لێی کڕیوە بەدینار و نیوێک، دروستە و هیچ حەرام نییە. زێڕێک کە زیوی تێدا بێ، نابێ بفرۆشێتە زێڕی پەتی یا خۆ زیوی پەتی یا خۆ بە دراوی زێڕینی پەتی. بەڵکوو دەبێ شتێک لە نێواندا بێ. هەر شتێکی زێڕین، کە زێڕەکەی پەتی نەبێ، هەروایە. ملوانکەی مرواری کە زێڕی تێدابێ، نابێ بە نرخی زێڕ بفرۆشرێ. بەرگی زێڕین، نابێ وەکوو زێڕ بفرۆشرێ، مەگەر ئەوەندەی زێڕی تێدا بێ کە بخرێتە سەر ئاور هیچی لێ نەیێ.

خۆراک نابێ بە قەرز بە خۆراک بفرۆشرێ هەرچەند دوو جۆری لێک جیاواز بن؛ بەڵکوو دەبێ لە هەمان جێدا دەست بە دەست بکرێن. ئەگەر لە یەک جۆر بن (وەکوو گەنم بە گەنم) نە بە قەرز دەبێ بفرۆشرێ، نە نە بایبەکی زۆرتر؛ بەڵکوو دەبێ بە یەک پێوانە بفروشرێن. ئەگەر بە کێشانە بەرانبەرن، دیسان هەر ڕەوا نییە، بەڵکوو بەرانبەری لە هەر شتێکدا دەبێ بەو پێوانەی کە باوە و هەمووان بە کاری دەبەن، بێ.

مەڕ بە خەسار فرۆتن لە بەرانبەر گۆشتدا، گەنم دان بە نانکەر لە باتی نان، کونجی و کاکڵەی گوێز لە بەرانبەر ڕۆنی کونجی و گوێز فرۆتن ناڕەوایە و بەیعی نایە؛ بەڵام ئەگەر نەیفرۆشێ و بەڵێن بدا کە دەیهێنێتەوە، ڕەوایە و دەتوانێ لێی بخوا، کەچی نابێتە خێوی و ناتوانێ بیفرۆشێ. نانکەر دەتوانێ دەست لە گەنمەکەیدا وەردا، بەڵام بەیعی تەواو نییە. کڕیار، گەنم لە نانەوا و نانەوایش نان لە کڕیار،

دەتوانێ داوا کاو بیهێنێتەوە. ئەگەر لە یەکتر ببوورن، تەواوە؛ بەڵام ئەگەر یەکێکیان بڵێ «دەتبوورم و حەڵاڵت دەکەم بەو مەرجەی تۆش لە من ببووری»، ئەم پەیڤە ئەویتر پووچەڵ دەکاتەوە. هەر چەند ئەم مەرجە بە راشکاوی نەڵێ و بڵێ: «گەردنت ئازا بێ»، چونکە دەزانێ ئەم مەرجەی لە دڵدایە و بێ ئەمە مەنێک گەنمی پێ نادا، ئەم گەردن ئازاییە دروست نییە و لەو دونیا خوا حوکمی بە سەردا دەدا. چونکە ئەم رازی بوونە بە زمانە، نەک دڵ؛ ئەوەش بە دڵ نەبێ شیاوی دوارۆژ نییە. بەڵام ئەگەر بڵێ «گەردەنت ئازا دەکەم، چ تۆ گەردنی من ئازا کەی چ نەکەی»، لە دڵیشدا هەروابێ، راست و بە جنیە. ئەوسا ئەویتریش هەروا بڵێ و ئیدی تەواوە. بەڵام ئەگەر گەردنی یەک ئازا نەکەن، کەچی نرخی هەردووکیان بەرانبەر بێ و رادەکەش هەروا، لەمەدا دژایەتییەک لەم جیهانە و سزایەک لەو جیهاندا تووشیان نابێ. کەچی ئەگەر جیاوازی و ناکۆکییەک لە ناودا بێ، لە دژایەتی ئەم جیهان و سزای ئەو دونیا بێبەش نابن.

هەر شتێک کە لە خۆراکێک چێ بکرێ، بە شتێک لە هەمان خۆراک نافرۆشرێ، هەر چەند بەرانبەر بن. ئەوەی لە گەنم هاتبێتە بەرهەم -وەکوو ئارد- بە گەنم نافرۆشرێ؛ ترێ بە سرکە نافرۆشرێ؛ هەروەها شیر بە پەنیر و سیراج و رۆن؛ ترێ بە ترێ و خورما بە خورما فرۆتنیان رەوا نییە. ئەم باسە دوور و درێژە، بەڵام ئەمەی هاتە گوتن، فێر بوونی پێویستە. تا ئەگەر شتێکی وای تووش هات، ئاگادار بێ کە نایزانێ و هان بدا کە بپرسێ و فێری بێ. چونکە ئەگەر ئەم رادەی کە بێژرا، نەیزانێ، نازانێ کە دەبێ پرسیار کا و لە تووش بوون خۆ ببوێرێ: رەنگە تووشی حەرام بێ و ئەو دەم برو بیانوو هیچ پارە ناکا؛ چونکە فێر بوونی زانست وەکوو بە پێی زانست جووڵانەوە، پێویست و فەرزە.

**پەیمانی سێهەم،** سەلەمە و لەمەشدا دە مەرج هەیە کە دەبێ لە بەرچاو بگیرێن:

**مەرجی یەکەم:** لە کاتی پەیماندا بڵێ: ئەم زێڕ یان زیو یا جلوبەرگ یا خۆ هەر شتەکیتر کە بێ، بە سەلەم دام بە خەروارێک گەنم و تایبەتمەندی ئەم گەنمە فلان و فلانە». هەر تایبەتمەندییەک کە بتوانێ ئاڵ و گۆڕ بەسەر نرخی گەنمەکەدا بێنێ و ناکرێ گوێی پێ نەدرێ، هەمووی بڵێ تا ئاشکرا بێ. ئەویتر بڵێ «قوبوولم کرد». یا خۆ دەتوانێ بڵێ: «ئەم شتەم لە تۆ کڕیوە بەم نرخە».

**مەرجی دووەم**– ئەوەی بڕیارە شتێک بفروشێ، گران نەیفرۆشێ؛ بەڵکوو قورسایی و ژمارەی دیاری کا، تا ئەگەر پێویست بوو کە بیگێڕێتەوە، بزانێ کە چەند و چوون بووە.

**مەرجی سێهەم**– ئەوەیە کە لە هەمان کۆڕدا نرخەکە بداتە فرۆشیار.

**مەرجی چوارەم**– دەبێ شتێک بداتە سەلەم کە بە گوتن تایبەتمەندییەکانی ئاشکرا بێ، وەکوو دانەوێڵە و پەموو و پەشم و ئاوریشم و گۆشتی ئاژەڵ. بەڵام هەر شتێک کە ماجوون بێ و لە چەن

شتی ئاوێتەکراو پێک هاتبێ و رادەی هەر یەک لەو شتانە خۆیان نەبێ، وەکوو «غالیە»[1] یاخۆ پێک هاتبێ لە چەن شت، وەکوو کەوانی ترکی، یا خۆ دەسکرد بێ وەکوو پێلاو و شەکال و تیری داتاشراو، بۆ سەلەم نابن و سەلەمیان بەتاڵە. سەلەم بۆ نان رەوایە. هەرچەند دەگەڵ ئاو و خوێ تێکەڵاوە؛ چونکە ئەو رادەیە لە ئاو و خوێ ئاڵۆزییەک پێک ناهێنێ.

**مەرجی پێنجم**- ئەگەر مۆڵەتدار کرێ، دەبێ ماوەکەی بە راشکاوی دیاری بکرێ؛ بۆ وێنە نەڵێ تا کاتی هەڵگرتنی خەلە و خەرمان، چونکە ئەوە کێشە پێک دێنێ. مۆڵەت بۆ وەرز شیاو نییە، بەڵکوو دەبێ مانگ و رۆژی دیاری بکرێ.

**مەرجی شەشم**- دەبێ شتێک بە سەلەم بدرێ کە لە کاتی دیاریکراودا بگاتە ئەنجام: بۆ وێنە ئەگەر میوە بە سەلەم بدا، تا کاتێ میوە پێنەگەیشتبێ، دروست نییە و بەتاڵە. کەچی ئەگەر بۆ ئەو ماوەیە بێ کە میوە پێ دەگا، رەوایە، ئەگەر لە سۆنگەی زیانێکەوە بەرهەمەکان نەگەیشتنە ئەنجام و فەوتان، خاوەن سەرمایە هەم دەتوانێ مۆڵەتی‌تر بدا و هەم دەتوانێ مامەڵەکە تێک بدا.

**مەرجی حەوتم** – دەبێ دیاری بکرێ کە لە کوێرا –شار یان گوند- تەسلیم بکرێ؛ لەوەی کە رەنگ بێ کێشەیەک بێتە گۆڕێ خۆ ببوێرێ.

**مەرجی هەشتم** – بە هیچ کلۆجێ نابێ ئاماژە بە شوێنێکی تایبەت کا و بۆ وێنە بڵێ ترێی ئەم بێسانە و گەنمی ئەم زەوینە؛ چونکە بەم چەشنە بەتاڵ و پووچەڵ دەبێتەوە.

**مەرجی نۆهەم**- نابێ شتێک بدرێتە سەلەم کە هێژا و دەگمەن بێ و زۆر کەم دەس دەکەوێ؛ وەکوو مرواریەکی گەورە کە دیتنەوەی شتێکی وا زۆر ئەستەمە، یاخۆ کارەکەرێکی بەدەو دەگەڵ منداڵی پێکەوە و شتی لەم بابەتە.

**مەرجی دەهەم** – کە نرخ و بایی خۆراکێک، خۆراکی‌تر بوو، سەلەم بۆی بەتاڵە و رەوا نییە؛ وەکوو گەنم بە هەرزن و شتی بەم جۆرە.

**پەیمانی چوارەم کرێیە**: ئەوەش دوو بنەمای هەیە: کرێ و قازانج.

بەلام پەیماندەر و پەیڤی پەیمان هەرئەوەیە کە بۆ مامەلە بێژرا.

**کرێ** دەبێ دیاری بکرێ، هەر بەو چەشنەی لە مامەڵەدا هاتە گوتن. ئەگەر خانوویەک بداتە کرێ بە مەرجی چاک کردنەوە، بەتاڵە؛ چونکە چەند و چوونی چاکسازی بەرپیوار و نادیارە. ئەگەریش بڵێت بە دە درهەم چاکی کاتەوە، ئەوەش بەتاڵە؛ چونکە کار بۆ چاک‌کردنی خانوو، نادیارە. کرێی

---

[1] - غالیە: بۆن و بەرامەیەکی خۆشە کە لە میسک و عەنبەر و شتی‌تر پێک دێ و رەنگی رەشەو مووی پێ خەزاو دەکەن.

پێست بۆ گوورین و ئارد یان سوێ بۆ ئاسیاو، بەتاڵە؛ هەرچی هاتنە ئەنجامی بە کردەوەی کرێکارەوە بەسترابێ، رەوانییە؛ چونکە ماوەکەی بە تەواوی دیاری نەکراوە. دەبێ بیێژرێ: «ساڵێ یان دوو ساڵ» تا ماوەکەی خویان بێ.

**قازانج**- هەر کردەوەیەکی رەوا و ئاشکرا، کە لە سۆنگەی رەنج و ئازارەوە پێک بێت، بە کرێ دانی رەوایە. کەواتە دەبێ پێنج مەرجی بۆ رەچاو بکرێ:

**مەرجی یەکەم**- دەبێ ئەو کردەوەیە بایەخ و نرخی هەبێ و رەنجی پێوە کێشرا بێ. ئەگەر کەسێک خواردنێ بە کرێ بگرێ تا دووکانی پێ برازێنێتەوە، یاخۆ دارێک بەکرێ بگرێ تا جلوبەرگی بەسەردا هەڵخا، یا خۆ سێوێک بەکرێ بگرێ تا بۆنی کا، ئەمانە هەموو نارەوا و بەتاڵن؛ چونکە ئەمانە وەکوو فرۆتنی دانەیەک گەنم بێنرخ و بایین.

ئەگەر فرۆشەرێک خاوەن شان و ناو و دەنگ بێ و بتوانێ بە وتەیەک شتێک بفرۆشی، بە کرێ گرتنی ئەو کەسە تا بە پەیڤپک شتێ بفرۆشێ، نارەوا و حەرامە؛ چونکە هیچ رەنج و ماندوو بوونێکی تێدا نییە. بەڵکوو فرۆشەر و کزیر[1]، کرێیەک کە پێیان دەدرێ، کاتێ حەلالە کە بۆ فرۆتن یا کڕینی شتەک قسەی زور کەن و زۆریش ببیسن و خۆی پێوە ماندوو کەن، ئەوسا بە قەدەر کارەکەیان مزیان پێ دەدرێ. بەڵام ئەوەی کە بۆتە باو و دە نیو وەردەگرن و مز بە گوێرەی ماڵ دەستێنن، نەک ماندوو بوون، بەڵکوو حەرام و نارەوایە. کەواتە ماڵی کزیر و فرۆشەرانێ کە بەم چەشنە مز وەردەگرن، حەرامە. کزیر دەتوانێ بە دوو جۆر لەم کێشەیە خۆ لابدا: **یەکەم**، ئەو مزەی کە پێیان دا، وەریبگرێ و چەقە نەکا و ماندوو بوونی خۆی و نرخی کالا نەکاتە بیانوو بۆ وەرگرتنی پارەی زۆرتر. **دووەم**، ئەوەی کە پێشتر بڵێ: «کە فرۆتم درهەمێ یا خۆ دینارێکم دەوێ» (بۆ وێنە)، خێوی کالاش پێی خۆش بێ، رەوایە. بەڵام ئەگەر بڵێ: «دە نیوی نرخی کالام دەوێ»، چونکە نرخی کالا بەرپیوارە، رەوا نییە و حەرامە.

**مەرجی دووەم** — کرێ دەبێ بۆ قازانج بێ و بۆ هەمان شت رەوا نیە. ئەگەر بێسان یا خۆ رەزێ بە کرێ بگرێ تا بەری بچنێ، رەوانیە؛ یا خۆ مانگایەک بگرێتە کرێ تا شیری بدۆشێ یا خۆ بە نیوە کاری هەڵیبگرێ و بەڵێن بدا کە نیوەی شیرەکەی هەڵبگرێ، دروست و رەوا نییە و بەتاڵە؛ چونکە ئالف و شیر، هەر دووکیان بەرپیوارن.

بەڵام ئەگەر ژنێ بەکرێ بگرێ تا شیر بە ساواکەی بدا، رەوایە؛ چونکە مەبەست بەخێو کردن و گەورەکردنی منداڵە و شیر بە دوای ئەم مەبەستەیە.

**مەرجی سێهەم**: دەبێ شتێ بە کرێ بگیرێ کە هەم رەوا بێ و هەم بدرێتە دەستەوە: بەکرێ

---

[1] - کزیر: دەلال و جارچی بۆ فرۆتنی شتێک.

گرتنی کەسێکی لاواز و بێ‌خوست بۆ کارێکی نەستەم و دژوار کە لە توانی بەدەرە، بەتاڵ و ناڕەوایە؛ بەکرێ گرتنی ژنێک کە لە مەهکدابێ، بۆ پاکژکردنی مزگەفت حەرام و ناڕەوایە؛ هەروەها بە کرێ گرتنی کەسێک بۆ کێشانی ددان، یان بڕینی دەست و کون‌کردنی گوێی منداڵ بۆ گوارە کردنە گوێ، حەرام و ناڕەوایە و مزەکەشیان هەر حەرامە. هەروەها ئەو نەخش و نیگارەی کە تەڕدەستان لە سەر دەستدا بە دەرزی دەری دێنن، ئەو کلاو دوورانەی کلاوی ئاوریشم بۆ پیاوان دەدروون، ئەو جلک دوورەی کەوای ئاڵ‌ووالای ئاوریشمین بۆ پیاو دەدووری، هەم کارەکەی و هەم مزەکەی هەموو حەرام و ناڕەوایە.

هەروەها بە کرێ گرتنی کەسێک بۆ فێرکردنی تەناف بازی حەرامە. ئەوەی بۆ سەیرکردنی رادەوەستێ، ئەگەر ئەو کەسە لەسەر تەناف بکەوێتە خوارەوەو بمرێ؛ لە مردنی ئەو کەسەدا بەشدارە؛ چونکە راوەستان و سەیرکردنی ئەمان بۆتە هۆی ئەوەی ئەو کەسە لەسەر تەناف هەڵزنێ. هەرکەسە شتێک بداتە تەنافباز و دواڵباز و کێردباز -کە خەریکی کاری پڕمەترسی و بێ قازانجن- گوناحکارە. هەروەها مزی لۆتی و گاڵتەچی و نەوحەبێژ و چەمەرگێڕ و شایەرێ کە بە خەڵکیدا هەڵبڵێ، حەرامە.

مزی دادوەر بۆ دەستوور و مزی شایەت بۆ شایەتی حەرامە. بەڵام ئەگەر دادوەریش تاپۆ بنووسێ و کرێی کاری خوی وەربگرێ رەوایە. چونکە نووسینی ئەو تاپۆیەی لە سەری فەرز نییە؛ بەڵام بەو مەرجەی نەبێتە کۆسپێ لە پێش خەڵکی‌تر بوو نووسینی تاپۆ و نامە و شتی‌تر. ئەگەر نەهێڵێ خەڵکی‌تر بپەرژێنە سەر ئەم کارە، تاپۆیەک کە بە سەعاتێک پێی دەنووسرێ، چ دینارێک وەربگرێ، چ دە دینار، حەرامە. بەڵام ئەگەر بەر بە کەسانی‌تر نەگرێ کەچی خۆی بڵێ من بە دە دینار یا خۆ زۆرتر، ئەم تاپۆیە دەنووسم، رەوایە و حەرام نییە. ئەگەر کەسێکی‌تر تاپۆکە بنوسێ و ئەم تەنیا مۆری پێدا بنێ و بڵێ چونکە ئەمە لە سەرم فەرز نییە، بۆ ئەم کارەی داوای پارە و مزکا، رەوا نییە و حەرامە؛ چونکە راستیەکەی ئەوەیە بەو رادەی کە ئەو مۆرە بڕشتی یاسایی بداتە تاپۆکە، فەرز و پێویستە: نرخی ماندوو بوونی مۆرکردنی ئەو تاپویە، وەکوو بایی سیرێک گەنمە، کە نرخێکی وای نییە، بەڵکوو نرخی مورەکە لە سۆنگەی دەسەڵاتی حاکمە و هەرچیش بە بۆنەی شان و پلەوە بێ، پارەو مزی ناکەوێ. مزی پارێزەری دادگا رەوایە، بەو مەرجەی نەبێتە بریکاری کەسێک کە بزانێ تاوانبارە؛ پارێزەر دەبێ راسبێژ بێ و لە راستی لایەنگری کار و درۆ نەکا و نەیەوێ بەرگی راستی بکاتە بەر ناڕاستیەک. کە راستی خویان بوو، ئیدی بێ دەنگ بێ، بەڵام گوتنی شتێک کە راستە قینەیەک ئاشکرا دەکا، رەوایە.

ناوبژیکەرێ کە دەیەوێ دوو کەس پێکەوە ئاشت کاتەوە، ناتوانێ لە هەر دوو لایەنی کێشەکە مز وەربگرێ، چونکە لە شەڕێکدا کاری دوو لایەن جێ‌بەجێ ناکرێ. بەڵام ئەگەر لە لایەن یەکێک لە

دوو لایەنەوە هان بدا و خۆی پێوە ماندوو کا و ئەو خۆ مانووکردنە بە نرخ بێ، مزی حەڵاڵ و ڕەوایە؛ بەو مەرجەی درۆیەک کە حەرام بێ، نەڵێ و لە کاریدا گزی نەکا و هیچ ڕاستیەک لە هەردوو لایەن نەشارێتەوە و بەدرۆ هیچ یەکیان نەترسێنێ بۆ وەی ئاشت ببنەوە؛ لە کاتێکدا ئەگەر ڕاستەقینەیان زانیبا، ئاشت نەدەبوونەوە، بە ئاوەها ناوبژیکردنێ کەمتر دوو لایەن ئاشت دەبنەوە. کەواتە، زۆربەی ناوبژی کردنەکان بە بێ زوڵم و لایەنگری و درۆ و فێڵ نین، بۆیە مزیان حەرامە.

کە ناوبژیکەرێک تێگەیشت یەکێک لە دوو لایەن ڕاستتر دەڵێ، نابێ بە فێڵ و گزی و خاپاندن خاوەن ماف هان بدات کە بە کەمتر لە مافی خۆی ئاشت بێتەوە. بەڵام ئەگەر بزانێ کە زوڵمێکی لێ دەوەشێتەوە، دەتوانێ فێڵی دەگەڵ کاو بیترسێنێ تا زوڵم و ستەمی لێ نەبێتەوە.

ئەوەی بڕوای بە خودا و ڕۆژی پەسلان هەبێ، چا دەزانێ کە هەر پەیڤێ لە دەمی دەربێ، لێی دەپرسنەوە و دەڵێن: «بۆت گوت؟ چیت گوت؟ ڕاستت گوت یان درۆ؟ بۆ مەبەستی ڕەوا گوتت یا نارەوا؟» بۆیە دەبێ بێجگە لە ڕاست، بە زاریدا چیدی نەیێ.

ئەوەی بۆ جێ بەجێ‌کردنی کاری کەسێک لە لای خونکارێک تکا دەکا و خۆی پێوەماندوو دەکا، دەتوانێ مز وەربگرێ؛ بەو مەرجەی بۆ ئەو کارەی ماندوو بێ و پارەی شان‌وشکۆی نەسێنێ و شتێک بڵێ کە بەجێ بێ: ئەگەر بۆ سەرکەوتنی ستەمکار بڵێ، یان بۆ مووچەی حەرام، یاخۆ شاردنەوەی شایەتیەکی ڕەوا، یا خۆ پەرژابێتە سەر کارێکی حەرام، وەرگرتنی مز بۆ ئەو کارە حەرام و نارەوایە.

ئەمانەی بێژران بۆ ئەوەی بوو دەهندەو وەرگری کرێ بزانن چ مەترسیگەلێک دەکاریان هەیە و خەلکی نەخۆندەوار بەمانە بزانن کە دەبێ لە هەر هێلییەک خۆ ببوێرن و شتێکیان نەزانی دەبێ بێرسن.

**مەرجی چوارەم** – ئەوەیە کە ئەو کارەی لەسەر فەرز نەبێ هەر وەکوو ئەوەی کە خەزاکەر بۆ خەزا نابێ مز وەربگرێ؛ چونکە کە لە ریزی خەزادا ئامادە بوو، خەزا لە سەری فەرزە. کرێ بۆ دادوەر و شایەتیش هەر بەم هۆیە نارەوایە. هەروەها کرێ دان بە کەسێک تا بە جێی کەسێکیتر ڕۆژوو بگرێ یا خۆ نوێژ بخوێنێ، ڕەوا نییە؛ چونکە بۆ ئەم کارەش بریکار و جێ‌نشین دانانرێ. سەندنی حەج بۆ کەسێک کە لە جێگادا کەوتبێ و هیوا بە چابوونەوەی نەبێ، ڕەوایە. وەرگرتنی مز بۆ فێرکردنی قورئان یا هەر زانستێکیتر ڕەوایە. بۆ کەندنی گۆڕ و شۆردنی مردوو و هەڵگرتنی تەرمی مردوو، کرێ سەندن ڕەوایە؛ هەرچەند ئەمانە لە ریزی فەرزی کیفایین (فرض کفایة) بۆ بەرنوێژی تەراویح و بانگ‌دان: لەم بابەتەدا را و بۆچوونی جیاواز هەیە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە وەرگرتنی مز بۆ ئەمانە حەرام نییە، چونکە ئەو کەسە کاتی بۆ تەرخان دەکا و خۆی پێوە ماندوو دەکا و لە مزگەفتدا ئامادە دەبێ؛ ئەو کرێیە بۆ ئەوەیە، نەک خوێندنی نوێژ و گوتنی بانگ. هەرچەند دەبێ ئەوەش بزانین

کە نەختێ ناحەزە و لێلی لە سەرە.

**مەرجی پێنجەم.** دەبێ کارەکە ئاشکرا و روون بێ: هەر وەکوو ئەوەی کەسێک کە چوار پێیەک بداتە کرێ دەبێ بزانێ چەن باری پێ دەکێشن، کێ باری پێ دەکێشێ، قورسی بارەکە چەندە؛ مەگین ئەوەی لە نێو خەڵکیدا پێوەرێکی باو بێ. ئەگەر زەوینێکی بەکرێ گرت، دەبێ روونی کاتەوە کە بۆ کێڵانی چ شتەک دەیەوێ، چونکە کاورس پتر لە گەنم زیانی بۆ خاک هەیە، مەگەر ئەوەش شتێکی باو و ئاسایی بێ. بە گشتی هەموو کرێیەک دەبێ بەم چەشنە ئاشکرا و روون بێ تا دوایی ناکۆکییەک نەیێتە گۆڕێ. هەر شتێکیش لە رووی نەزانییەوە بێ و دژایەتی پێک بێنێ. بەتاڵ و پووچەڵە.

**پەیمانی پێنجەم هاوبەشییە**، کە لەسەر سێ بنەمایە:

**بنەمای یەکەم،** سەرمایەیە. دەبێ دراو بێ. وەکوو زێڕ و زیو، نەک کۆتاڵ و جلک و شتیتر؛ هەروەها دەبێ قورساییەکی روون کاتەوە؛ دەبێ خێوی سەرمایەکە، پارەکەی بداتە دەست بەڕێوەبەر و نابێ لە کن خۆی رایگرێ.

**بنەمای دووهەم،** قازانجە. دەبێ بەشی بەڕێوەبەر دیاری بکرێ، وەکوو نیوە یا خۆ سێ یەکی قازانج. ئەگەر بڵێت: «دە درەم بۆ تۆ -یا من- هەرچی مایەوە دابەشی دەکەین»، بەتاڵە.

**بنەمای سێهەم** کارە. مەرج ئەوەیە ئەو کارە، بازرگانی و مامەڵە بێ؛ ئەوەش بریتیە لە کڕین و فرۆتن، نەک پیشەسازی. ئەگەر گەنم بداتە نانەوا تاکوو بیکاتە نان و قازانجەکەی نیوە بە نیوە دابەش بکرێ، رەوا نییە؛ تووی کەتانیش بدا بۆ گرتنی رۆن، ئەوەش بە هەمان چەشنە. ئەگەر بۆ مامەڵەش مەرج دابنێ کە نابێ بێجگە لە لای فلان‌کەس لە کەسیتر شت بکڕی یا خۆ بفرۆشی، ئەوەش بەتاڵە. بە کورتی هەر مەرجێ مامەڵەکە بەرتەسک کاتەوە، رەوا نییە.

ئەم گرێبەستە دەبێ وابێ کە بڵێ: «ئەم پارەیەم پێتدا تا مامەڵەی پێ بکەی و قازانجەکەی نیوە بە نیوە بێ». ئەویتر بڵێ: «قەبووڵە». کە پەیمانیان بەست، بەڕێوەبەر دەبێتە بریکار بۆ کڕین و فرۆتن؛ هەر کاتیش خاوەن سەرمایە پێی خۆش بێ، بۆی هەیە پێوەندییەکەی تێک بدا و داوای سەرمایەکەی کا. ئەگەر سەرمایەکە هەمووی پارە و قازانج بێ، بەشی دەکەن؛ ئەگەر سەرمایەکە پارە نەبێ و کاڵا بێ، هەر بەو چەشنە دەبێ دابەش بکرێ و بەڕێوەبەر لە سەری نییە کە بیفرۆشێ؛ ئەگەر بەڕێوەبەر بڵێ : «دەیفرۆشم»، خێوی سەرمایە بۆی هەیە بەرگری لێ بکا، مەگەر ئەوەی کە

موشتەرییەکی دیبێتەوە کە بە قازانجێکی چاک بیکڕێ، لەم کاتەدا خاوەن سەرمایە ئیزنی نییە. ئەگەر هەموو سەرمایەکە کالا بوو و قازانجی تێدا بوو، بەڕێوەبەر دەبێ بە قەدەر سەرمایەی خاوەن ماڵ لە کالاکەی بفرۆشێ و پارەکەی بداتەوە و هەرچی لە کالا ماوەتەوە دابەشی کا و مەرج نییە هەمووی بفرۆشێ.

کە یەک ساڵی تەواو بەسەر سامانەکەیاندا رابورد، دەبێ بەهای سامانەکەیان دیاری بکەن و رادەی زەکاتەکەی دیاری کەن و هەرکەس لە ماڵی خۆی زەکاتەکەی بدا.

بەڕێوەبەر نابێ بە بێ ئیزنی خاوەن ماڵ، ماڵی هاوبەش بو سەفەر ببا. ئەگەر بردی، دەبێ نەفەوتانی ماڵەکە مسۆگەر کا. ئەگەر بە ئیزنی خێوی ماڵ رۆیشت، خەرجی رێ لەسەر ماڵی هاوبەشە؛ هەروەها گوژمەی باربەر و کرێکار و چارەوێ و... لەسەر ماڵەکەیە. کە لە سەفەر گەڕایەوە، ئەوەی لە گوژمەی سەفەر مابووەوە، لەسەر ماڵە و دەبێ بیگێڕێتەوە.

## پەیمانی شەشەم، شەریکەیە

شەریکە، بریتیە لەوەی لەو ماڵوسامانەی کە هێناویانە، هاوبەش بن و ئیزنی یەکتری بدەن بۆ دەستێوەردان لەو ماڵەدا؛ قازانجی ئەو ماڵە بە گوێرەی رادەی سەرمایەیەک کە هێنراوە، دابەش دەکرێ؛ بۆ وێنە ئەگەر سەرمایەکەیان نیوەبەنیوە بوو، قازانجەکەش نیوەبە نیوە دابەش دەکرێ. نابێ بۆ دابەش‌کردنی قازانج مەرج دابنرێ، مەگین ئەوەی یەکێکیان بەڕێوەبەر و جێبەجێکەری کارەکە بێ، ئەو کات لە سۆنگەی ئەو ماندوو بوونەوە، بەشێکی زۆرتری دەدرێتێ؛ ئەمە وەکوو هاوبەشی و شەریکەیە پێکەوە.

بەلام سێ شەریکەی باو هەیە کە ناڕەواو نابەجێن:

**یەکێک** شەریکەی کۆڵبەر و پیشەسازانە کە پەیمان دەبەستن هەرچی خێر و قازانجیانە لە نێوانیاندا هاوبەش بێ؛ ئەم جۆرە ناڕەوایە و مزی هەرکەس مافی خۆیە و نادرێتە کەسی‌تر.

**شەریکەیەکی‌تر** «مفاوضە»ی پێ دەبێژرێ و ئەوەش بریتیە لەوەی کە تاقمێک سەرمایەکەیان لە نێواندا رابنێن و بڵێن سوود و زیان هەرچی هەبێ، هاوبەشین؛ ئەمەش بەتاڵ و ناڕەوایە.

**شەریکییەکی‌تر** ئەوەیە کە دوو کەس یەکیان خاوەن ماڵ بێ و یەکیان خاوەن شانوشکۆ و پاگەی حکوومی؛ خاوەن ماڵ بە پێی پەیڤی خاوەن پاگە مامەڵە کاو قازانجەکەیان هاوبەش بن؛ ئەمەش بەتاڵە.

ئەمەی لە زانستی مامەڵە و کاسبی هاتە گوتن، زانینی بۆ هەمووان پێویستە. بێجگە لەمەی بێژرا شتێکی‌تر بەدەگمەن بێتە کایەوە، ئەگەر تووش هات، دەبێ پرسیار کا؛ ئەگەر نەپرسێ و نەشزانێ،

ڕەنگە تووشی حەرام بێ و ئەو کات بڕوبیانوو هیچ پارە ناکا.

**بەشی سێهەم – بە داد و ئینساف بوون لە مامەڵەدا**

ئەوەی بێژرا مەرجی دروستبوونی مامەڵەیە بە ڕێژەی ڕواڵەتی شەرع؛ زۆر مامەڵە هەیە کە لە ڕواڵەتدا دەڵێن دروستە، کەچی ئەو کەسە تووشی زیان و گوناح دەبێ؛ ئەمەش مامەڵەیەکە کە ڕەنج و ئازار و زیانی موسوڵمانانی تێدایە و بە دوو جۆرە:یەکەم گشتی و دووەم تایبەت.

ئەوەی هۆی **ئازاری گشتیە**، دووانە:

یەکەم **پاوان کردنە**[1] و پاوانکەر، کەوتوونە بەر لەحنەتی خودا. پاوانکەر ئەوەیە کە خواردن بکڕێ و هەماری کا تا گران دەبێ، ئینجا بیفرۆشێ. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی چل ڕۆژ خواردنێک هەمار کا تا گران بێ و پاشان هەمووی بەخێر و سەدەقە بدات، هێشتا پاکانەی تاوانی ناکا». دیسان فەرمووی: «هەرکەس بە مەبەستی گران کردن، چل ڕۆژ خۆراک لە هەمار کا، پەروەردگار لێی بێزار دەبێ و ئەویش لە خودا بێزارە». پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس خۆراکێ بکڕێ و بیبا لە شارێکیتردا بە نرخی ڕۆژ بیفرۆشێ، وەکی ئەوەیە بەخێری دابێ»، یاخۆ «وەکوو ئەوەیە کۆیلەیەکی ڕزگار کردبێ». عەلی گوتوویە : «هەرکەس چل ڕۆژ خواردنێ هەمارکا، دڵی ڕەش هەڵدەگەڕێ». هەماری پاوانگەرێکیان پێ پیشان دا، دەستووری دا تا ئاوریان لە هەمارەکەی بەردا.

یەکێک لە پێشوونان بە بریکارێکدا خواردنی لە بەسرەوە نارد بۆ واسیت کە بفرۆشرێ. کە گەیشتە واسیت، ئەو خواردنە لەوێ هەرزان بوو، یەک حەوتە درەنگی کرد تا گران بوو، پاشان بە نرخێکی زۆرتر فرۆشتی و ڕووداوەکەی لە نامەکەیدا نووسی بۆ خاوەن ماڵ. لە پەرسڤیدا گوتی: «من بە قازانجی کەم و ساغی دین چاوتێر بووم. نەدەبوا دینی ئێمەت بە قازانجی زۆرتر بگۆڕایەوە. ئەمەی کردت تاوانێکی زۆر گەورە بوو؛ دەبێ نووکوبەدی پارەکەت بە خێر و سەدەقە لە نێو خەڵکدا دابەش کەی، بەڵکوو خودا بمانبووڕێ؛ هەرچەند هێشتا دڵنیا نیم خودا بەمەش لێمان خۆش بێ».

هۆی بە حەرام زانینی ئەم کارە، زەرەر و زیانێکە کە تووشی خەڵکی دێ؛ چونکە خواردن هۆی ژین و مافی مرۆڤە: کە بفرۆشرێ، ڕەوایە و خەڵکی دەیکڕن و چێژی لێ دەبەن، کە یەکێک هەمووی دەکڕێ و دەبەندی دەکا تا دەستی خەڵکی پێی ڕانەگا، وەکی ئەوەیە کە ئاوی حەلاڵ لە خەڵکوخوا بشارنەوە تا تینوو بن و بە گرانتر بیکڕن. چەمکی گوناح لە کڕین و فرۆتنی خۆراک ئەمەیە.

---

[1]. پاوان کردن: ئیحتیکار کردن.

بەڵام جووتیارێ کە خودانی خەلە و خەرمان بێ، ئەوە تایبەتی خۆیە و بە حەزی خۆی دەتوانێ بیفرۆشێ. لە سەری مەرج نییە کە بە خێرایی بیفرۆشێ؛ بەڵام چاتر وایە کەمتر رایگرێ و خێراتر بیفرۆشێ، ئەگەر لە ناخیدا حەزێک بێ بۆ ئەوەی بەرهەمەکەی گران بێ و پاشان بیفرۆشی، ئەو حەزەی ناحەزە.

پاوان‌کردنی دەرمان و ئەو شتانەی کە خۆراک نین و خەڵکی زۆر پێویستیان پێ نییە، حەرام نییە؛ کەچی خۆراک پاوان‌کردن بە تەواوی حەرامە. پاوان‌کردنی ئەو شتانەش کە لە ریزی خۆراکن، وەکوو گۆشت و رۆن و وەک ئەوانە، نارەوایە هەرچەند دروستی ئەوەیە کە حەرام نەبێ، بەڵام دەبێ بە کارێکی دزیو بێتە هەژمار. هەمارکردنی خۆراک لەو دەمەیدا کە بژیو دەست نەکەوێ، حەرامە. کەچی لە ودەمەی کە خۆراک مشەمەر بێ و هەرکەس بیەوێ، بتوانێ بیکرێ، نەفرۆتنی حەرام نییە؛ چونکە زۆریش پێویست نییە. تاقمێ گوتوویانە ئەم کارەش هەر حەرامە. بەڵام راستتر ئەوەیە کە دزیوە، چونکە ئەو کەسە چاوەنۆڕی گرانی دەبێ و چاوەڕوان بوون بۆ ئازار کێشانی خەڵکوخوا ناشرینە. پێشوونان دوو جۆرە مامەڵەیان بە دزیو زانیوە: فرۆتنی خۆراک و فرۆتنی تەرمەپۆش[1]. چونکە چاوەڕوانی بۆ مردن و رەنج خەڵکی دزێو و ناحەزە. دوو پیشەشیان بە دزێو زانیوە: قەساوی؛ چونکە دڵ سەخت دەکا و کاری زێڕینگەران، چونکە بۆ خەملاندنی دونیا دەبێ.

**جۆری دووهەم** لە رەنج و ئازاری گشتی، شتی زەغەڵ[2] و قەڵب فرۆتنە لە مامەڵەدا. چونکە ئەگەر کریار خۆی نەزانێ چی پێ فرۆشراوە، زولمی لێ کراوە؛ ئەگەریش زانی، رەنگە ئەویش کەسێکی‌تر بخاپێنێ و ئەم فریودانە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەردەوام بێ و خەڵکی یەکتر بخاپێنن. بۆیە یەکێک لە گەورەکان گوتوویە: «یەک درهەمی زەغەڵ، خراپتر لە دزینی سەد درهەمە». چونکە گوناح و تاوانی دزی هەر لەو دەمەدا دوایی دێ، کەچی دراوی زەغەڵ دەستبەدەست دەڕوا و رەنگە دەیان و سەدان ساڵ پاش مردنیش هەر بەردەوام بێ و چارەڕەش ئەو کەسەیە کە پاش مردنی، گوناحەکانی بەردەوام بن و دواییان نەیێ و بە رێژەی ئەوە سزا دەدرێ.

بۆ زێڕ و زیوی زەغەڵ دەبێ پێنج شت بزانرێ: **یەکەم** ئەوەی کە کاتێ دراوێکی قەڵبی دەست کەوت، دەبێ بیفەوتێنێ و بیهاوێژێتە نێو بیرێکەوە و نەیداتە کەسی‌تر و پێی نەڵێ ئەمە قەڵبە؛ چونکە رەنگە ئەو کەسە، کەسێکی‌تری پێ بخاپێنێ.

**دووەم**، مرۆی بازاڕی دەبێ دراو بە باشی بناسێ و دراوی زەغەڵ لە نازەغەڵ هەڵاوێرێ؛ نە بۆ ئەو مەبەستەی دراوی قەڵب لە خەڵکی وەرنەگرێ، بەڵکم بۆ ئەو مەبەستەی کە پارەی زەغەڵ نەداتە

---

۱. تەرمەپۆش: کفن.

۲. زەغەڵ: بدل؛ نائەسل.

دەستی خەڵکوخوا و تووشی خەساریان نەکا. گەر فێر نەبێ و بە هەڵە دراوێکی قەڵب بە کەسێکبدا، تووشی گوناح بووە. چونکە فێربوونی ئەو زانستانەی پێوەندییان بە مامڵەوەیە، لەسەر بازاڕی پێویستە.

**سێهەم**، هەرچەند وەریبگرێ بەو مەبەستەی پێغەمبەر فەرمووی « رَحِمَ اللهُ امْرأً سَهْلَ الْقَضاء وسَهْلَ الإقْيضاء»[1]، ئەوە چاکە، بەو مەرجەی بیخاتە نێو چاڵەوە؛ بەڵام ئەگەر بە تەمابێ خەرجی کا، ڕەوانییە؛ هەرچەند خۆی بڵێ زەغەڵە.

**چوارم** و (**پێنجم**)، قەڵب ئەوەیە کە هیچ زێڕ و زیوی تێدا نەبێ. بەڵام ئەو دراوەی کە نەختێ زێڕ و زیوی بێ، پێویست نییە بخرێتە نێو چاڵ. بەڵام کە ویستی خەرجی کا، دەبێ دوو شتی لەبەر چاو بێ: یەکەم ئەوەی کە بیڵێ و نەیشارێتەوە و دووهەم ئەوەی کە بیداتە کەسێک کە لێی ئارخەیان بێ کە فێڵی پێ ناکا. ئەگەر بە ڕەوای زانی و خەرجی کرد و هیچی نەگوت، وەکوو ئەوەیە کەسێک ترێ بفرۆشێ و دڵنیا بێ کە کڕیار ئەو ترێیە دەکاتە شەراو و بە شەراوی دەیخوا، یاخۆ چەک بە کەسێک بفرۆشێ کە ڕێی خەڵکوخوا ببڕێ: ئەمە حەرامە. بە بۆنەی دژواری ئەمانەت لە مامەڵەوە، پێشوونان گوتوویانە: «بازرگانی ئەمانەتدار، هێژاتر لە عابد و پارێزکار».

بەشی دووهەم **ستەمی تایبەتە**، کە بێجگە لەو کەسەی مامەڵەی دەگەڵ دەکرێ، بەربینگی کەس ناگرێ. هەر مامەڵەیەک کە ستەمێکی تێدا بێ، حەرام و ناڕەوایە.

بە کورتی، هەر شتێک کە پێی خۆش نییە دەگەڵی بکرێ، نابێ دەگەڵ هیچ موسوڵمانیتری بکات. چونکە ئەوەی بۆ خۆی پەسەندی نەکا و بۆ خەڵکی پەسەندی کا، بڕوا و ئیمانی تەواو نییە.

ڕاڤەی ئەمە چوار شتە:

**یەکەم** – زۆرتر لەوەی شیاوە، پەسنی هیچ کاڵایەکی نەکا، چونکە ئەمە هەم فێڵە و هەم زوڵم. پێویست بە پەسنی ڕاستیش ناکا، چونکە بێ پەسنی ئەویش، کڕیار بۆ خۆی دەیناسێ و ئەم پەیڤەی بێ هۆیە. مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ[2] هەرچی بڵێ، لێی دەپرسنەوە کە «بۆت گوت؟» ئەگەر بە گۆترە گوتبێتت، هیچ برو بیانوویەک پارە ناکا.

بەڵام سوێند خواردن: ئەگەر درۆ بێ، لە گوناحە گەورەکانە؛ ئەگەریش ڕاست بێ، سووکایەتییە کە بۆ کارێکی پەست و بێبایەخ ناوی پەروەردگار ببەن. لە خەبەردا واهاتووە کە: «وای بە حاڵی

---

۱. خودا بەزەیی بەو کەسەیدا دێ کە کاری مامەڵە ئاسان دەکا.

۲. قورئان (۱۸/۵۰) هەر ورتەی لە دەم دەربچێ، چاوەدێرێکی لا هەیە (هـ).

بازرگانان بۆ گوتنی وەڵلا و بیللا و وای بە حاڵی پیشەسازان لە بەڵێنی درۆ». هەروەها لە خەبەردا هاتووە کە: «ئەوەی کالاکانی بە سوێند بفرۆشێ، پەروەردگار ڕۆژی پەسلان سەیری ناکا». دەڵێن یوونسی کوڕی عوبەید، قوماشی ئاوریشمی دەفرۆشت. ڕۆژێک سەوەتەکەی ئاوەڵا کرد لە پێش کڕیاراندا. شاگردەکەی گوتی: «پەروەردگارا! لە بەرگەکانی بەهەشت خەڵاتم کە». یوونس سەوەتەکەی کۆوە کرد و ئەو ڕۆژە هیچی نەفرۆشت؛ چونکە ترسا ئەو شتەی شاگردەکەی دەیڵێ پەسنێ بێ بۆ قوماشەکەی.

**فەرزی دووهەم** لە مامەڵەدا ئەوەیە کە هیچ لە عەیب و نوقسانی کالاکەی نەشارێتەوە و نووکوبەدی پێی بڵێ. ئەگەر لێی شاردیەوە، فێڵی کردووە و خۆی لە ڕاستی بواردووە. کەوایە، ستەمکار و گوناحبارە. هەر کات بەدەوترین بەرگ لە پێش چاوان ڕابنێ، یا لە شوێنی تاریک دایبنێ، یا جوانتر لەوەی کە هەیە پیشانی بدا، یاخۆ تای چاتر لە پێڵاو و شەکالی ڕانێ، ستەمکار و خراپکارە. ڕۆژێک پێغەمبەر لە لای پیاوێکدا ڕادەبوورد، گەنمی دەفرۆت؛ دەستی کردە نێو گەنمەکەیدا، ناوەندی گەنمەکە شێی بوو. فەرمووی: «ئەمە چییە؟» گوتی: «ئاو لێی داوە». فەرمووی «بۆ ویشکت نەکردەوە؟ مَن غَشَّنا فَلَیس مِنّا»؛ ئەوەی فێڵ کا لە ئێمە نییە.

پیاوێ حوشترێکی فرۆتە سێسەد درهەم، کەچی پێیەکی نوقسان بوو. «واثلة بن اسقع» لە یارانی پێغەمبەر، لەوێ بوو، ئاگای لێ نەبوو؛ کە تێگەیشت بە دوویا هەڵات و گوتی: «پێیەکی نوقسانە». پیاوەکە گەڕایەوە و سەد درهەمی لە فرۆشیارەکە ئەستاندەوە. فرۆشیار گوتی: «بۆ ئەم مامەڵەت لێم تێک دا؟» گوتی چونکە لە پێغەمبەرم بیست فەرمووی: «مامەڵەیەک کە نوقسانی کالای تێدا بەرپیوار بێ، حەلال نییە؛ هەروەها ئەوەش بیزانێ و هیچ نەڵێ، گوناحبارە». دیسان گوتی: «پێغەمبەر بەڵێنی لێ ئەستاندووین بۆ ڕاوێژ و چاکە و میهرەبانی دەگەڵ موسوڵمانان. بۆیە شاردنەوەی کەمو کووڕی کالا لە ڕیزی ڕاوێژ و چاکە نییە».

ئەوەش خویانە کە مامەڵەی لەم چەشنە دژوارە و لە کۆشەوەگەلی مەزن دێتە هەژمار و بە دوو شت ئاسان دەبێ:

**یەکەم** ئەوەی کە کالای کێشەدار و نوقسان نەکڕێ، ئەوەشی کە کڕی دڵی خۆی لێ ئارخەیان کا و بڵێ ئەگەر فێڵیان دەگەڵ کردووم، من تووشی ئەم زیانە هاتووم، نابێ منیش لەگەڵ کەسیتر فێڵ کەم؛ کە خۆی تووک و نزای ئەوەی فێڵی دەگەڵ کردووە کرد، خۆشی نەخاتە بەر لەحنەتی کەسێکیتر. دەبێ لەوەش دڵنیا بێ کە ڕزق و ڕۆزی بە فێڵ و گزی، زۆر نابێ؛ بەڵکوو بە دزی و گزی، ودم و پێزی ماڵو سامانی بە ئێجگار دەڕواو بەهرەی لێ نابا و ئەوەی لە لاڕێوە بە دەسی دێنێ، بە جارێ دەبێتە زیان بۆی و تووشی خەسار دێ. وەکوو ئەو پیاوەی لێ دێ کە ئاوی دەکردە نێو

شیر و دەیفرۆشت، مەڕەکانی دەگەڵ منداڵێ نارد بۆ لەوەڕ. لە پڕ لافاوێک هات و مەڕەکانی هەموو برد. منداڵەکە گوتی بە کابرا: «ئەو ئاوەی کە دەمانکردە نێو شیرەکەوە، پێکرا کۆوە بوو و مەڕەکانی خنکاند».

پێغەمبەر فەرمووی: «کە گزی و دەغەڵ لە نێو مامەڵەدا ڕۆچوو، پێزو ودمیش دەگەڵی دەچێ». واتای ودم ئەوەیە کە کەسێک سامانیکی زۆر کەمی بێ، کەچی ژیانی پێ هەڵسووڕێ و بە هیمنی و ئارخەیانی ژیان باتە سەر و خێری زۆری لەو ماڵە کەمە دەست کەوێ؛ کەسی واش هەیە کە ماڵوسامانی لە رادەبەدەر بێ، کەچی هیچ چێژ و کەڵکی بۆی نەبێ. کەواتە، دەبێ داوای ودم و پێز کا نەک زۆر و زەوەندی. ودم لە بێخەوشی و راستی دایە، چونکە هەرکەس بێخەوش و راست بوو، خەڵکی زۆرتر مامەڵەی دەگەڵ دەکەن و قازانجی زۆرتر دەبێ، کەچی ئەگەر بە چەفت و چەوڵی ناوی دەرکرد، خەڵکوخوا خۆیان لێی دەپارێزن.

**دووهەم** ئەوەیە کە بزانێ تەمەنی پتر لە سەد ساڵ نابێ، کەچی ژیانی پاش مردن هەتا هەتاییە؛ کەواتە چۆن دەوێرێ تەمەنی هەتاهەتایی خۆی بۆ چەن رۆژی ژین لەم دونیایە و کۆوەکردنی چەن دراوێک، بە خەسار بدا؟ دەبێ ئەم بیرانە لە دڵی خۆیدا دووپاتە کاتەوە تا گزی و فێڵ و خاپاندنی لە دڵدا جوان و بەدەو نەبێ. پێغەمبەر فەرمووی: «خەڵکی تا دینیان لە دونیا خۆشتر بوێ ، لە پەنای "لا اله الا الله"دان، بەڵام کە دونیایان پتر لە دینیان خۆش ویست، ئەگەر ئەم پەیڤە بڵێن (واتە: لا اله الا الله) پەروەردگار پێیان دەڵێ درۆ دەکەن و راست نین».

هەر بەو چەشنەی لە مامەڵەدا گزی و فزی حەرامە، لە پیشەکانیتریشدا هەر وایە. کاری زەغەڵ کردنیش حەرامە، مەگەر ئەوەی داینەشارێ و خویانی کا. سەبارەت بە هیڤاختن[1] لە ئەحمەدی حەنبەل پرسیاران کرد، گوتی: : بۆ ئەو کەسەی کە دەیهەوێ لە بەری کا، رەوایە و بۆ ئەو کەسەی کە بە تەمایە خەڵکی پێ بخاپێنێ حەرامە».

فەرزی **سێهەم**، ئەوەیە کە لە سەنگ و ترازوودا گزی نەکا و پێوانەی راست بێ. پەروەردگار فەرمووی: «وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِين؛ هاورا لەو کەسانی کاتێ کە دەکڕن، بە پێوانەی کەم دەیکڕن، کە بفرۆشن بە پێوانەی گران دەیفرۆشن». بۆیە پێشوونان کە شتێکیان دەکڕی، تۆزکاڵی سووکتر دەیانکڕی، کە شتێکیان دەفرۆشت، نەختێ قورستر دەیانفرۆشت و دەیانگوت: «ئەم تۆزکاڵە پەردەیەکە لە نێوان ئێمە و دۆژەهدا»؛ دەترسان نەتوانن راست بپێون و دەیانگوت: «گێلۆکەیە ئەو کەسەی بەهەشتێک کە حەوت بەرانبەری ئاسمان و زەوی پانتایی هەیە، بە تۆزکاڵێ بفرۆشێ؛ زور نەزان و لاوژەیە

---

[1] - هیڤاختن: پینە کردن، دووراندنەوەی قوماش و پارچەی دراو.

ئەوکەسەی تووبا بفرۆشێ بە وەیل».

فوزەیلی عەییاز کوڕەکەی دی کە پارە دەبژێرێ تا بیداتە کەسێک و لە هەمان کاتدا خەریکی پاکژکردنی چڵکی سەر پارەکە بوو. فوزەیل پێی گوت: «کوڕم! ئەم کارەت لە دوو حەج و عومرە هێژاترە».

پێشوونان گوتوویانە: «خێوی دوو ترازوو کە بە یەکیان بفرۆشێ و بە یەکیان بکڕێ لە هەموو خراپکاران، خراپکارترە». هەروەها بەزازێک کە کاتی قوماش کڕین، شل بیگرێ و کاتی فرۆتن توند رایگرە، قەساوێک کە بە ئاوەژووی ئەو شتەی باو بێ، گۆشت و ئێسک پێکرا بفرۆشێ، کەسێک کە خەلە بفرۆشێ و پتر لەو شتەی ئاسایی بێ خۆلی تیابێ، ئەمانە هەموو هەروان و کارەکەیان حەرامە. لەسەر هەموو کەس فەرزە کە لە هەموو کار و مامەڵەیەکدا بە ویژدان و بە داد بێ. ئەوەی بۆ خۆی دەیەوێ، بۆ خەڵکوخواش هەر وای بوێ. لە هیچ شتەکدا خۆی لە هەڤالی سەرتر نەزانێ، بەم جۆرەش بوون زۆر دژوارە. بۆیە پەروەردگار گوتی: «وَ إن مِنكُمْ إلاّ وارِدُها» کەس نییە خۆی لە دۆژەەبورێ، بەلام ئەوەی رێگای پارێزکاری بگرێتە بەر، بلەز لەوێ دەرباز دەبێ.

**فەرزی چوارم،** نرخ و بایی هیچ کالایەک دانەشارێ و گزی نەکا. چونکە پێغەمبەر نەهی کردووە لەوەی کە کەسێک لە پێش کارواندا بڕوا و نرخی ئەو کالایە لە شاردا داپۆشێ و بە هەرزان بیکڕێ. هەرکەس وای کرد، خودانی کالا بۆی هەیە مامەڵەکە تێک بدات. هەروەها پێغەمبەر نەهی کردووە لەوەی کە نامۆیەک کالایەک بباتە شارێک و یەکێک پێی بڵێ، بارەکەت لە لای من دانێ، کە گران بوو، بۆتی دەفرۆشم. هەروەها نەهی کراوە لەوەی کە کەسێک بە نرخێکی زۆرتر داوای کالایەک بکا بەبێ ئەوەی کڕیار بێ و تەنیا مەبەستی گرانکردنی ئەو کالایە بێ؛ هەرکەس دەگەڵ خودانی کالا ئەم پەیمانەی بەستبێ تا خەڵکی پێ هەڵفریوێنن، کە خەڵک لێی گەیشتن بۆیان هەیە مامەڵەکەیان تێک بدەن. لە بازاڕدا واباوە کەسێک کالای بۆ هەراجی رادەنێ، هەندێ کەس بۆ خاپاندنی خەڵکی بایی زۆرتر دەڵێن، ئەم کردەش هەر حەرامە. هەروەها گرانفرۆتن یان هەرزان کڕین لە مرۆی ساویلکە و ساکار، ناڕەوایە؛ هەرچەند دەڵێن ئەم مامەڵەیە لە روالەتدا هیچ کەمایەسییەکی نییە، کەچی کە راستی رووداو خویان دەبێ، دیارە کە تەژی لە گزی و فزییە. یەکێک لە تابعین لە بەسرە بوو، کرێکارێکی لە باژێڕی تووسەوە بۆی نووسی، شەکر ئەم سال بە زیان چووە، تا گران نەبووە هەرچیت پێ دەکرێ، بیکڕە. ئەویش شەکرێ زۆری کڕی و لە کاتی خۆیدا فرۆتی و سی هەزار درەمی قازانج کرد. لە کردەی خۆیدا راماو گوتی ستەمت لە موسوڵمانان کرد ئەم رووداوەت لێ شاردنەوە، کەنگێ وا دەبێ؟ ئەو سی هەزار درهەمی هەڵگرت و رۆیشتە لای فروشیاری شەکرەکە و پێی گوت : «ئەمە هی تۆیە». گوتی: «بۆچی؟» راستی رووداوی بۆ گێڕایەوە. فرۆشیار گوتی: «لێت

دەبوورم»، کە گەڕایە، شەو کاتی خەوتن بە بیریداهات کە «ڕەنگە کابرا لە رووی هەڵنەهاتبێ وەریبگرێ و من ستەمم لێ کردبێ». بەیانی گەڕایەوە و ئەوەندە پاڕایەوە تا کابرا سی هەزار درهەمی لێسەند.

هەرکەس ویستی نرخی ئەو شتەی کڕیوە بیڵێ، بێجگە لە راست چیتر نەڵێ و گزی نەکا. ئەگەر ماەکەی کەمایەسییەکی بوو، بە خودانی بڵێتەوە، ئەگەر لە سۆنگەی برادەری یا خۆ خزمایەتی فرۆشیارەوە شتێکی بە گران کڕیوە و لێی بوردووە و هیچی نەگوتووە، دەبێ راستی پێ بڵێ، ئەگەر کالایەکی لەهەمبەر شتەکی دە دیناریدا داوە و ئەو شتە پتر لە نۆ دینار ناکا، نابێ بڵێ نرخی ئەو کالایە دە دینارە. ئەگەر کاتی کڕین، هەرزان کڕیوە و هەنووکە بایی نۆ دینارە، دەبێ راستی بڵێ. راڤەی ئەم باسە دوور و درێژە و لەم نووسراوەدا پتر لەوەی هاتە گوتن، نابێژرێ، کەچی بازرگانان ستەمی زۆر دەکەن و خۆیان پێ نازانن. بەلام دەبێ ئاگادار بن، هەرچی خەلکی دەگەڵی کردن و پێیان ناخۆش بوو، خۆشی نابێ لەگەڵ خەلکی وابکا، دەبێ ئەمە بکاتە پێودانێ بۆ خۆی. چونکە کڕیار لە پەیڤی ئەو دلنیا دەبێ و چا دەزانێ ئەوەی کڕیویە، هەر بایی ئەوەندە بووە. کەچی ئەگەر کێشەیەکی تێدابوو، پێی رەزا نابێ و ئەوە دزییە.

## بەشی چوارەم- چاکەکاری لە مامەڵەدا

پەروەردگار هەر بەو چەشنەی بۆ دادوەری فەرموویە، بۆ چاکەشی فەرمووە: إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ[1] پاژی پێشوو، راڤەی دادوەری بوو، تا تووشی زولم نەبن. ئەم پاژە راڤەی چاکەیە. پەروەردگار دەڵێ: إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ[2]، ئەوەی دادوەرانە جووڵابێتەوە، سەرمایەی دینەکەی خۆی پاراستووە، کەچی خێر و قازانج لە چاکەدایە و ژیر و زانا ئەو کەسەیە قازانجی دوارۆژ لە هیچ مامەڵەیەکدا نەفەوتێنێ.

«احسان» چاکەیەکە کە بۆ هەر دوو سەری مامەڵە قازانجی هەیە و لە سەرت فەرز نییە. چاکەش سێ ئاستی هەیە:

**یەکەم:** هەرچەند کڕیار پێی خۆش بێ، بەلام پاپای قازانجی زۆری لە سەردا نەبێ. «سێری سەقەتی» دووکانی بوو، پتر لە نیو لە دە قازانجی وەرنەدەگرت. جارێک شەست دینار بادامی کڕی. بادام گران بوو. کابرایەک گوتی بۆتی دەفرۆشم. وتی بە شەست و سێدینار بیفرۆشە. کابرا گوتی:

---

1. قورئان (١٦/٩٠) خودا بە دادوەری و چاکە ئەمری فەرمووە
2. قورئان (٧/٥٦) ئەو کەسانەی چاکە کارن لە بەزەیی خودا نزیکن. (هـ)

«هەنووکە نەوە دینار دەکا، بۆ بە شەست و سێ بفرۆشم؟» سەقەتی گوتی: «بەڵێنم بە خۆ داوە پتر لە نیو لە دە قازانج وەرنەگرم. نامەوێ لە بەڵێنی خۆم کلابم». کابرا گوتی:«منیش نامەوێ کاڵای تۆ بە هەرزان بفرۆشم». نە ئەم بەو پارە کڕی نە ئەو بە زۆرتر فروشتی. رادەی چاکە ئاوەهایە.

«محەمەد کوڕی مونکەدیر» لە گەورەکان بوو، دووکانێکی بوو جلکی تێدا دەفرۆت؛ نرخی هەندێکیان پێنج و هەندێکیان دە دینار بوون. کاتێ لە دووکان نەبوو، شاگردەکەی قوماشێکی پێنج دیناری فرۆتبووە دە دینار. کە گەڕایەوە و راستی رووداوی لێ ئاشکرا بوو، لە بەیانییەوە تا درەنگان بە دووی کابرای کڕیاردا گەڕا تا بیبینێتەوە. کە دیبەوە گوتی: «ئەو قوماشە پتر لە پێنج دینار ناکا». کابرا گوتی: «رەنگە من خۆم حەزم لێ بێ». گوتی: «وایە، بەڵام من ئەوەی بۆ خۆم پەسندی نەکەم، بۆ کەسیتر پەسندی ناکەم. وەرە و یا ئەم مامەڵەیە تێک دە، یا پێنج دینارم لێ بستێنە، یاخۆ قوماشێکی چاترت دەدەمێ». کابرا پێنج دیناری وەرگرتەوە. لە کەسێکی پرسی: «ئەم کابرا کێ بوو؟» گوتی: «ئەمە محەمەد کوڕی مونکەدیرە». کابرا گوتی: «سُبْحانَ الله! ئەمە هەر ئەو کابرایە بوو ئێمە لە سارادا کاتێ باران نەدەباری و نوێژە بارانەمان دەخوێند و ناویمان دەبرد، هەر لەو کاتەدا باران دای دەکرد».

لای پێشوونان وا باو بووە کە قازانجی کەمیان وەردەگرت و مامەڵەی زۆریان دەکرد. ئەمەیان لا لە چاوەڕوانی بۆ قازانجی زۆرتر هێژاتر بوو.

عەلی لە بازاڕی کووفەدا دەسووڕایەوە و دەیگوت: «خەڵکینە! چش لە قازانجی کەم مەکەن تا زۆریشتان لە دەست نەچێ». لە عەبدولرەحمانیعەوفیان پرسی: «هۆی دەوڵەمەندیت چییە؟» گوتی: «قازانجی کەمم رەتنەدەکرد، هەرکەس ئاژەڵێکی دێنا رامدەگرت و بۆم دەفرۆت، لە رۆژێکدا هەزار حوشترم بە پارەکەی خۆی فرۆتەوە و تەنیا هەزار پاوەنم بۆ مایەوە، هەر یەکەیان درهەمێکی دەکرد و درهەمێکیش ئالفم لە ئەستۆ کەوت؛ سەرجەم دوو هەزار درەم قازانجم کرد».

**دووهەم** ئەوەیە کە کاڵای هەژاران بە گرانتر بکڕێ تا پێی شادوشوکور بن؛ وەکوو گوڕیسی پیرێژنان، میوە لە دەستی زارۆکان و هەژارێ کە لە رێدا مابێتەوە. ئەم چاکەیە بەدەوتر و هێژاترە لە سەدەقە. هەرکەس وابکا دەکەوێتە بەر ئەم دوعای پێغەمبەرە کە فەرمووی: «رَحِمَ‌الله و امْرَأً سَهْلَ الْبَیْعِ وَ سَهْلَ الشریٰ[1]».

بەڵام لە دەوڵەمەند بە گران کڕین نە چاکەیە و نە پێ زانین و بە تەنیا فەوتاندنی کاڵایە؛ بەڵکوو چەقە کردن و هەرزان کڕین هێژاترە. حەسەن و حوسێن کاتێ لە دەوڵەمەندێ شتێکیان دەکڕی ئەوەندەیان چەقە دەکرد تا بۆی دەکرێ هەرزانتر بیکڕن، تا ئەوەی خاوەن کاڵا پێ دەگوتن: «ئەنگۆ

---

١. خودا بەزەیی بەو کەسەدا بێ کە کڕین و فرۆتن ئاسان دەکا.

ڕۆژی هەزار دینار دەکەنە خێر و سەدەقە، ئێستا بۆچی هێندە. چەقە دەکەن؟» لەر پەرسڤدا دەیانگوت: «ئەوەی دەیدەین لە ڕێی پەروەردگارەو زۆریش کەمە ؛ بەلام بە گران کالا کڕین، زیانی ئاوەز و مالە».

**سێهەم** – چاکە لە ئەستاندنی پارەدا بە سێ جۆرە: ئاسانگیر و کەم ئەستاندنی پارە لە هەنێ کەس، مۆلەت و دوان بە هەندێتر، شێلگیری نەکردن لە سەر ئەستاندنی پارەی چاک و بێخەوش[1]. پێغەمبەر فەرمووی : «ڕەحمەتی خودا لەو کەسەی کەمامەلە کردن ئاسانتر دەکا». دیسان فەرمووی: «ئەوەی لە مامەلەدا ئاسانگیر بێ، پەروەردگار کارەکانی بۆ ئاسان دەکا».

هیچ چاکەیەک هێژاتر و بەدموتر لە مۆلەت دان بە هەژار نییە. ئەگەر بە ڕاست هیچی نەبوو، مۆلەت دان فەرزە و لە ریزی دادوەرییە؛ بەلام ئەگەر هەیبێ، کەچی بۆی بووز نەخوا دەم و دەست پارەکەی بداو ناچار بێ شتێکی بە زیان بفروشێ یاخۆ شتێکی کە زۆریشی پێ نیازە بە خەسار بدا، مۆلەت دان بە ئاوەها کەسێک چاکەیەکی زۆر گەورەیە.

پێغەمبەر فەرمووی: «ڕۆژی پەسلان کابرایەکیان هێنا، هیچ چاکەیەک لەدین و دەفتەری کردەوەکانیدا نەبوو، لێیان پرسی تۆ قەد چاکەت نەکردووە؟ گوتی: "هیچ چاکەم نەکردووە، بێجگە لەوەی بە شاگردەکانم دەگوت ئەگەر قەرزدارێکمان دەستی تەنگ بوو، لێی سەخت مەگرن و مۆلەتی پێ بدەن". پەروەردگار فەرمووی: "تۆش ئەمرۆ دەسکورت و داماوی و چاتر وایە ئێمەش لێت ئاسان بگرین و لێی خۆش بوو"».

لە خەبەردا هاتووە کە «هەرکەس قەرز بداتە کەسێک بۆ تا ماوەیەک، هەر ڕۆژ کە بە سەریدا ڕادەبرێ، بۆی چاکەیەک دەنووسرێ و پاش ئەو ماوەیەش ئەگەر مۆلەتی پێ بدا، هەر ڕۆژ کە لێی ڕادەبرێ، وەکوو ئەوەیە هەموو ئەو پارەیە دابێتە سەدەقە». لە پێشوونان کەسی وا بووە کە کاتێ قەرزی داوەتە کەسێک نەیویستووە پێی بدەنەوە، تا هەموو ڕۆژێ ئەو سەدەقەیە بەخێر بۆ بنووسن.

پێغەمبەر فەرمووی: «لە سەر دەرگای بەهەشت بینیم کە نووسرابوو، یەک درەم سەدقە، دە درهەمە و یەک درهەم قەرز هەژدە درهەمە». هۆی ئەمەش ئەوەیە کە کەس قەرز ناکا، مەگین ئەوەی بە ڕاستی پێویستی بێ. بەلام سەدەقە بۆی هەیە بکەوێتە دەست بێنیازێک.

**چوارەم**: دانەوەی قەرز. چاتر وایە کە نیازی بە داوا کردنەوە نەبێ و بلەز بیداتەوە. هەروەها دەبێ لە پارەیەکی چاک و پاکتر بیداتەوەو بە دەستی خۆی بیگێڕێتەوەو بڕواتە مالی خودانی پارەکە و بە کەسدا نەینێرێتەوە. لە خەبەردا هاتووە کە: «چاترینی ئەنگۆ ئەوەیە کە باشتر قەرز بداتەوە».

---

[1] - ئەم بەشەم لە کتێبی ئەحیا وەرگێراوە، چونکە ڕوونتر و ئاشکراتر بوو.

دیسان لە خەبەردا هاتووە کە «هەرکەس قەرز کا و لە بیری ئەوەدا بێ کە بە چاکی قەرزەکەی بداتەوە، پەروەردگار چەن فریشتەی بە سەردا دەکاتە چاودێر تا ئاگاداری بن و دوعای بەخێری بۆ بکەن تا ئەو کاتەی قەرزەکەی دەداتەوە».

ئەگەر پێی کرا کە قەرزەکەی بداتەوە و بەبێ ڕەزای خێوی پارەکە لە دانەوەی خۆی ببوێرێ، ستەمکار و گوناحبارە و لە نوێژ و ڕۆژوو لە خەون و خەوەریدا دەکەوێتە بەر لەحنەتی پەروەردگار: ئەمە سووچێکە کە لە خەونیشدا لێی نابێتەوە.

بۆ توانی دانەوەی قەرز، مەرج نییە پارەی نەختی بێ، بەڵکوو ئەگەر شتێکی بێ کە بتوانێ بیفرۆشێ و نەیفرۆشێ گوناحبارە؛ ئەگەر بە جێی پارە کاڵایەک بداتە خاوەن پارە و ئەویش لەم کارەی نابەدڵ بێ، گوناحبارەو تا دڵی کابرا لە خۆی خۆش نەکا لەو ستەمە دەرباز نابێ. ئەمە گوناح و تاوانێکی زۆر گەورەیە، کەچی خەڵک بە سووک پێیدا دەڕوانن.

**پێنجەم**: ئەوەیە کە دەگەڵ هەرکەس مامەڵەی کرد و ئەو کەسە لە مامەڵەکەی پاشگەز بووەوە، ئەمیش مامەڵەکەی تێک بدا. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس مامەڵەی کەسێک کە لە مامەڵەکەی پەژیوان بێ تێک بدا، پەروەردگار گوناحەکانی پێ دەبەخشێ». ئەمەی کە بێژرا فەرز نییە، بەڵام خێرو ودمی زۆر و زەوەندەیە.

**شەشەم**: ئەوەیە کە بە قەرز شت بە هەژاران بفرۆشی- ئەگەر زور کەمیش بێ- بەو مەبەستەی تانەیانبێ، لێیان نەسێنێتەوە و ئەگەر بە نەداری مردن، لێیان خوش بێ. لە پێشوونان کەس هەبووە کە دوو دەفتەری بووە، لە نێو یەکێکیاندا ناوی هەژاران و بەلەنگازانی بە چەشنێک دەنووسێ کە بێجگە لە خۆی کەس بۆی نەخوێندرێتەوە، تا ئەگەر هێنایانەوە، لێیان وەربگرێ و ئەگەر نەیانهێنایەوە و خۆی مرد، کەس نەیانناسێ. هەرچەند ئەمانە لە ڕیزی چاترینەکان نەبوون، بەڵکوو چاکترینەکان ئەو کەسانە بوون کە ناوی هەژارانیان لە هیچ کوێ نەدەنووسی، تا ئەگەر نەیانهێنایەوە تەما براویان بن.

دینداران لە مامەڵەدا ئاوەها بوون. ئاستی پیاوانی دین لە مامەڵەی دونیاییدا خویان دەبێ: هەرکەس بە بۆنەی بڕوایەوە خزمی لە تاقە دراویک پاراست، لە ڕیزی پیاوانی دینە.

## بەشی پێنجەم- بەزەیی هاتنەوەی بازرگان بە سەر دینی خۆیدا

ئەوەی بپەرژێتە سەر مامەڵەی دونیا و لە مامەڵەی دوارۆژ ئاگای ببرێ، چارەڕەشە. ئەمە حاڵی ئەو کەسەیە کە سەوەیەکی[1] زێڕین دەگەڵ گوزەیەکی قوڕین بگۆڕێتەوە. گۆزەی قوڕین وەکی دونیایە و

[1] - سەوە: گۆزە.

سەوەی زێڕین دوارۆژە کە هەم زۆر بە نرخە و هەمیش قەد فەوتانی بۆ نییە. مامەڵەی دونیا بۆ زادی دوارۆژ نابێ، تەنانەت کۆشەوەی زۆری دەوێ تا نەکەوێتە سەر ڕێگەی دۆژەە. سەرمایەی مرۆڤ دین و دوارۆژیە، نابێ ئاگای لێ ببڕێ و بەزەیی بە خۆدا نەیەتەوە و نووکوبەدی بپەرژێتە سەرکار و مامەڵەی دونیا. کاتێ بەزەیی بە دینیدا دێتەوە کە حەوت مەرجی ڕەچاو کردبێ:

**یەکەم** – هەموو ڕۆژ، مەبەستی جوان لە دڵدا دووپاتە کاتەوە و بڵێ: بۆیە دەڕواتە بازاڕ تا بژیوی خۆی و خێزانی دابین کا و لە خەڵک بێ نیاز بێ و تەما لە ماڵی خەڵکی نەکا و ئەوەندە بژیو وەدەست خا تا بە ئارخەیانی خەریکی بەندەگی پەروەردگار بێ و ڕێی دوارۆژ ببڕێ». هەروەها نییەت بێنێ کە «ئەمڕۆ دەگەڵ خەڵکی بە دلۆڤانی و چاکە و ڕاستی دەبزوێتەوە و تا بۆی بکرێ خەڵکی بۆ چاکە کردن هان دەدا و لە خراپەیان بەگری دەکا و هەرکەس تووشی خراپەیەک بێ، بەرهەڵستی دەبێ». ئەم نییەتانە لە ڕیزی کردەوەگەلی دوارۆژن و قازانج بە دینی دەگەینن.

**دووەم،** دەبێ بزانێ تاقە ڕۆژێ ژینی پێ ناکرێ ئەگەر لانی کەم هەزار کەس هەر یەکە و بە کارێکەوە خەریک نەبن؛ وەکوو نانەواو و جۆلا و هەلاج و ئاسنگەر و... ؛ هەموو بۆ ئەو کار دەکەن و نیازی بە هەمووانەو لە ڕاستیدا هەموو پێویستیان بە یەکترەو نابێ هەموو پەرای ئەم کەن و خێر و قازانجیان پێ بگا، کەچی قازانجی ئەم بە کەس نەگا؛ چونکە هەموو خەڵکی لەم دونیایەدا ڕێبگارن و دەبێ دەست لە نێو دەستی یەکدا ڕێگا ببڕن؛ دەبێ بەو مەبەستە بڕواتە بازاڕ و بڵێ: «دەڕۆمە بازاڕ تا لە سۆنگەی منەوە خەڵک ئاسوودە بن، هەر بەو جورەی لە سۆنگەی خەڵکەو من ئاسوودەم».
نیشانەی ڕاستبوونی ئەم پەیڤە ئەوەیە کە بپەرژێتە سەر کارێ کە نیازی خەڵک بێ: چونکە گەر وانەبێ کاری خەڵکی تووشی بۆشایی دێ؛ نە وەکوو کاری زێڕینگەر و وێنەکێش و گەچکار، کە ئەمانە هەموو خەملاندنی دونیان و هیچ پێویستێک پێی نییە و نەکردنی چاترە؛ هەر چەند ڕەوایە، بەلام بەرگی ئاوریشم دووراندن و زێڕ بۆ پیاوان چێ کردن، حەرامەو ئەو پیشانەی کە پێشوونان خۆیان لێ بواردووە بریتین لە فرۆتنی خۆراک، فرۆتنی تەرمەپۆش، قەساوی، سەڕافی (چونکە بە ئەستەم بتوانێ لە وردەکارییەکانی ڕوبا دەرباز بێ)، حەجامەت (چونکە بە مەبەستی خێر و قازانج، خەڵک بریندار دەکا و ڕەنگە قازانجەکەش تەواو نەبێ)، قومەشکەنی و چەرمچێتی (چونکە بە دەگمەن بەرگی خاوێن دەبەر دەکەن) و هەروەها حوشتروانی و دەلالی، چونکە ناتوانێ بەر زۆربێژی بگرێ.

لە هەواڵدا واهاتووە کە چاترین بازرگانی، قوماش فرۆشییە و باشترین پیشە، دووراندنی مەشکە و شتی پاراوە. لە خەبەردایە کە «ئەگەر لە بەهەشتدا مامەڵە بایە، ئەو مامەڵەیە قوماش فرۆشی بوو؛ ئەگەر لە دۆژەەبایە سەڕافی بوو». چوار پیشەیان بە نالەبار زانیوە: جۆلایی، لۆکەفرۆشی و دووک-

تراشی و مامۆستایی. هۆکەشی ئەوەیە پێوەندی ئەم تاقمە دەگەڵ ژنان و مندالانە و هەرکەس دەگەڵ ژنان و زارۆکان تێکەڵ بێ، عەقلی سووک دەبێ.

**سێهەم** – ئەوەیە کە بازاڕی دونیا تەگەرە نەخاتە نێو بازاڕی دوارۆژی. بازاڕی دوارۆژ مزگەفتە و پەردەردگار فەرموویە: لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ واتە ئاگادار بن‌مامەڵەی دونیا پەکی زیکری پەروەردگارتان نەخا، چونکە ئەو کاتە زیان دەکەن. عومەر بە بازرگانانی دەگوت: «سەرەتای رۆژ بۆ دوارۆژتان تەرخان کەن و پاش ئەوە بۆ دونیاتان». لە نێو پێشووناندا وا باو بووە کە بەیانی و شەوانە، خەریکی مامەڵەی دوارۆژ بوون، یا لە مزگەفتدا خەریکی یادی پەروەردگار بوون یا لە کۆڕی زانستدا خەریکی فێربوونی زانست بوون. نێوانی رۆژ بۆ مامڵە تەرخان دەکرا و بەیانیان زارۆکان و ناموسوڵمانان ئاژەڵیان دەفرۆشت. چونکە پیاوان هەموویان لە مزگەوتدا بوون. لە خەبەردا واهاتووە کە: «کاتێ فریشتەکان نامەی کردەوەکانی کەسێک بۆ ئاسمان دەبەن، ئەگەر لە سەرەتا و ئەنجامی رۆژدا چاکەیەکی کردبێ، مەودای ئەو دوانەی پێ دەبەخشرێ». لە خەبەردا هاتووە کە «فریشتەکانی شەو و فریشتەکانی رۆژ، بەرەبەیان و نیوەشەوان پێک دەگەن، پەروەردگار دەڵێ: "بەندەکانم لە چ دۆخێکدا بوون کاتێ وێڵووکردن؟" دەڵێن: "کاتێ پێیان گەیشتین نوێژیان دەکرد، کاتێکیش لێیان جیا بووینەوە، هەر نوێژیان دەکرد". پەروەردگار دەڵێ: "شایەتیم لە ئەنگۆ سەند و لێیان بووردم"».

لەمەودای رۆژدا کە دەنگی بانگی هاتە گوێ، رانەمێنێ؛ لە هەر کارێکدا کە بوو، دەس راگرێ و روو لە مزگەوت نێ. لە شرۆڤەی ئەم ئایەتەدا کە دەڵێ: لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ[1]؛ ئەمانە کەسانێک بوون کە ئاسنگەریان کاتێ چەکوشی هەڵدەگرت، کە بانگی مزگەفتی دەهاتە گوێ، رایدەنا، مەشک‌دووریان کاتێ درەوشی دەچەقاند، پاش بیستنی بانگی نوێژ هەڵینەدەبڕی.

**چوارەم** – لە بازاڕدا لە زیکر و یاد و بیری خودا خافڵ نەبێ: تا بۆی دەلوێ دڵ و زمانی بێکار نەبێ و چا بزانێ ئەو قازانجەی لەم کاتەدا بفەوتێ، هەموو دونیا لە هەمبەری هیچ ناهێنێ. هەروەها زیکر لە نێو بێ ئاگایاندا پاداشی زۆرترە، پێغەمبەر فەرمووی: «یادکەرەوەی پەروەردگار لە نێو خەڵکی لە گوێ گادا خەوتوودا وەکوو دارێکی شین و جوانە لە نێو بێشەلانێکی وشکدا، یان زیندوویێکی لە نێو مردوواندا و خەباتگێرێکە دە نێو هەڵاتواندا». دیسان فەرمووی: «ئەوەی بگاتە نێو بازاڕ و بڵێ : لا اِلَه الاّ الله وَحْدَهُ لا شَریکَ لَهْ، لَهُ الْمُلْکُ وَ لَهُ الَحَمْدُ یُحْیِي وَ یُمیتُ وَ هُوَ حَيٌ لا یَموتُ، بِیَدِهِ الْخَیْرُ وَ هُوَ عَلی کُلِّ شَيءٍ قَدیر، دوو هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنووسرێ».

---

[1] - قورئان؛ ٢٤/٣٧.

ڕۆژێک جونەید دەیگوت: «زۆر کەس هەیە لە نێو بازاڕدا کە بۆی هەیە گوێی سۆفییەکان بگرێ و لەسەر جێیان دایانبنێ». دیسان گوتی: «کەس دەناسم لە نێو بازاڕدا کە زیکری ڕۆژانەی بەرانبەرە لەگەڵ سێسەد ڕەکات نوێژ و سی‌هەزار تەسبیح».

بە کورتی ئەوەی بڕواتە نێو بازاڕەوە تا بژیوی ژینی دابین کاو بپەرژێتە سەر دین، دەبێ هەروابێ و ڕاستی مەبەستی بەرەڵلا نەکا؛ بەلام ئەگەر کەسێک بۆ زۆر و زیادکردنی ماڵوسامان بڕواتە بازاڕ، ئەمەی لێ نایە و تەنانەت ئەگەر بڕواتە نێو مزگەفتەوە، دڵی لە لای کار و دووکانە و ئاژاوە دایدەگرێ.

**پێنجەم** – ئەوەیە کە زۆر لە بازاڕدا چاوچنۆک نەبێ، بە چەشنێ کە بەر لە هەمووان بڕوا و پاش هەمووان بگەڕێتەوە. هەروەها سەفەری دوور و درێژی پڕمەترسی و لە گەمیەنیشتن و وەکوو ئەمانە، شاندەری ئەو پەڕی چاونەزێری بۆ دونیان.

مەعازی جەبەل گوتوویە: «شەیتان کوڕێکی هەیە بە ناوی "زلنبور". بریکاری بابیە لە بازاڕدا. پێی دەڵێ: "بڕۆرە نێو بازاڕەوە و درۆ و سوێند و گزی و فزی و لە دڵیاندا بڕازێنەوە و لەگەڵ ئەو کەسەی کە بەر لە هەموان دێ و پاش هەموان دەڕوا، هاوڕێ بە"». لە خەبەردا واهاتووە کە «خراپترین شوێن بازاڕەو خراپترین کەس ئەو کەسەیە کە بەر لە هەمووان دێ و دوای هەمووان دەڕوا». کەواتە لە سەری پێویستە سەرەتا بڕواتە کۆڕی زانست و نوێژی چاشت کا، پاشان بڕواتە بازاڕ. کە ئەوەندەی قازانج دەسکەوت کاروباری دونیای ڕێک خا، دەبێ بگەڕێتەوە مزگەوت و مامەڵەی دوارۆژی کاو بژیوی ژینی دواڕۆژی پێک بێنێ؛ چونکە ئەو ژینە بێ بڕانەوەیە و تۆیشووی پێویسترە.

«حَمّاد بن سلمە» مامۆستای ئەبووحەنیفە بوو، سەرپۆشی دەفرۆشت: کە دوو حەبەی قازانج دەکرد، سەوەتەکەی کۆوە دەکرد و دەگەڕایەوە.

ئیبراهیم کوڕی یەسار بە ئیبراهیمی ئەدهەمی گوت: «ئەمڕۆ بو قوڕکاری دەڕۆم» گوتی: ئەی کوڕی یەسار! تۆ بۆت دەگەڕێن و بۆی دەگەڕێ. ئەوەی بۆت دەگەڕێ تا لێی بزر نەبی و ئەو شتەی بۆی دەگەڕی تا لێت بزر نەبێ. مەگەر قەد چاوچنۆکی بێبەش و تەنبەڵی بەشدارت نەدیوە؟» گوتی: «لە ماڵی مندا بێجگە لە دانگێ زیو چیدی نییە». گوتی: «مخابن لەو موسوڵمانییە! تۆ دانگێک زیوت هەیە و دەڕۆی بۆ قوڕکاری؟»

لە نێو پێشووناندا تاقمێک لە حەوتەدا تەنیا دوو ڕۆژ دەڕۆیشتنە نێو بازاڕ، تاقمێ هەموو ڕۆژ دەڕۆیشتن و بۆ نوێژی نیوەڕۆ هەڵدەستان، تاقمێکیش بۆ نوێژی عەسر دەگەڕانەوە و بە گشتی هەرکەس بژیوی ڕۆژی بە دەس دێنە، دەگەڕایەوە مزگەوت.

**شەشم**: لە لێڵی و شوبهە خۆی بپارێزێ. ئەگەر توخنی حەرام کەوێ، گوناحکار و تاوانبارە، لە هەرچی دڕدۆنگ بوو، لە دڵی خۆی پرسیار کا نەک لە موفتییان- ئەگەر ئەهلی دڵ بێ و ئەو

کەسانەش دەگەمەنن – هەرچی لە دڵدا بێزی لێی بوو، نەیکڕێ. لەگەڵ ستەمکاران و دەست و پێوەندییان مامەڵە نەکا: بە هیچ ستەمکارێک قەرز نەدا، چونکە بە مردنی خەمبار دەبێ و بە دەوڵەمەندبوونی شاد. شیاویش نییە بە مردنی ستەمکار خەمبار بێ و بە دەڵەمەند بوونی شاد. هەرچی پێیان بفرۆشێ و دڵنیا بێ بۆ ستەمکردن بەهرەی لێ دەبەن، لەو ستەمدا هاوبەشن.

لە ئەنجامدا دەبێ دەگەڵ هەموو کەس مامەڵە نەکا و هان بدا ئەوانەی شیاوی مامەڵەن بیانبینێتەوە. گوتوویانە کە: ڕۆژگارێک بووە کە هەرکەس ڕۆیشتۆتە نێو بازاڕ گوتوویە: «دەگەڵ کێ مامەڵە کەم؟» گوتوویانە: «دەگەڵ هەرکەس کە پێت خۆشە، چونکوو هەمووان پارێزکارن». پاش ئەوە ڕۆژگارێک هات کە گوتیان: دەگەڵ کەس، مامەڵە مەکە، بێجگە لە فلان و فلانکەس». مەترسی ئەوەش هەیە ڕۆژگارێک بێت و کەس بۆ مامەڵە دەست نەکەوێ.

ئەمەیان بەر لە سەردەمی ئێمە گوتووە. لەم ڕۆژگارەدا وای لێهاتووە کە جیاوازی لە مامەڵەدا نەماوە و هەموو بەخۆڕایی دەبزوونەوە؛ چونکە لە زانایانی زانستکورت و دینبەتاڵیان بیستووە کە: «ماڵی دونیا هەموو بۆتە یەکڕەنگ و سەرلەبەری حەرامە». ئەمەش هەڵەیەکی زۆر گەورەیە و ڕاڤەی ئەم باسە لە کتێبی حەلاڵ و حەرامدا دێتە گوتن، گەر خوا یار بێ.

**حەوتەم** – دەگەڵ هەرکەس کە مامەڵەی کرد لە دانوستان و گفت و پەیڤدا لەگەڵی ڕاست و بێگرێ و گۆڵ بێ. دەبێ ئەوەش بزانێ کە ڕۆژی پەسڵان لە هەموو کردەوە و گفت و لفتێکی دەکۆڵنەوە و لێی ورد دەبنەوە. یەکێک لە گەورەکان، بازرگانێکی لە خەودا بینی، گوتی: «پەروەردگار چی دەگەڵ کردی؟» گوتی: «پەنجا هەزار کتێبی لە پێشم دانا، گوتم خودایا! ئەمانە هەموو گوناحی منن؟ گوتی: لەگەڵ پەنجا هەزار کەس مامەڵەت کرد، هەر یەکەیان کتێبێکە. گوتی لە هەر یەکیاندا سەروبەری مامەڵەی خۆمم بینی لەگەڵ ئەو کەسە».

بە کورتی ئەگەر بەقەدەر بۆلێکی ڕەش فێڵی دەگەڵ کەسێک کردبێ، لەو دونیادا ئۆباڵی وە ئەستۆیە و بەربینگی پێ دەگیرێ و هیچ شتێک ناتوانێ لەو بەندە دەربازی کا.

ئەمەی بێژرا ڕەوشتی پێشوونان بوو کە بە گوێرەی شەرع مامەڵەیان دەکرد. ئەم شێوازە نەماوە و زانستی مامەڵە لەم ڕۆژگارەدا لە بیر کراوە؛ کەواتە هەرکەس یەک لەم سوننەتانە بەجێ بێنێ، خێرو ودمی زۆروزەوەندە. پێغەمبەر فەرمووی: «ڕۆژگارێ دێ کە هەرکەس دە یەکی ئەو پارێزکارییەی ئێوە بکات، بۆی بەستە کە بڕواتە بەهەشت». گوتیان : «بۆچی؟» گوتی: «چونکە ئێوە بۆ چاکە کردن هاڤاڵتان هەیە و لەم سۆنگەوە بۆتان سانایە، کەچی ئەوان یاوەریان نییە و لە نێو نووستواندا نامۆن».

ئەمە بۆیە بێژرا، تا ئەگەر کەسێک ئەمانەی بیست، دڵتەنگ نەبێ و نەڵێ کەنگێ ئەم کارانەم پێدەکرێ؛ دەبێ بزانێ هەر ئەوەی کە بۆی جێبەجێ دەکرێ، زۆرو زەوەندە. هەرکەس دڵنیا بێ

لەوەی کە پەسلان زۆر چاکتر و بەرزتر لەم جیهانەیە، جێبەجێکردنی ئەم کارانەی بۆ ئاسان دەبێ. هەروەها بۆ چاودێری بەسەر کردەوەکاندا بێجگە لە هەژاری هیچ چار نییە. هەلگرتنی باری هەژارییەک کە ببێتە هۆی پادشایی دوارۆژ، ئاسانترە. هەروەک خویانە، خەلکی رەنجی بێبەرگی، ئازاری دڕک و دالی سەفەر دەدەنە بەر بە هیوای هاتنەدی خەونی پادشایی یاخۆ دەولەمەندی، هەرچەند ئەگەر مردنیان پێ رابگا و رەنج بە خەسار بن؛ کەواتە زۆر دژوار نییە گەر کەسێک بۆ گەیشتن بە خونکاری دوارۆژ، خۆی لە کارێک ببوێرێ کە پێی خۆش نییە دەگەل خۆی بکرێ.

## بنه‌مای چواره‌م – ناسینی حه‌ڵاڵ و حه‌رام و لێڵی[1]

پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووی: «طلبُ الْحَلالِ فَرِيضةٌ عَلى كُلِّ مُسْلِمٍ»[2]، ناتوانی ماڵی حه‌ڵاڵ به ده‌س بێنی تا نه‌زانی حه‌ڵاڵ چییه. دیسان فه‌رمووی: «هه‌م حه‌ڵاڵ و هه‌میش حه‌رام ئاشکران، که‌چی له نێوانیاندا لێڵیگه‌لی دژوار و به‌رپیوار هه‌یه. هه‌رکه‌س توخنیان که‌وێ، تووشی حه‌رام دێ». ئه‌م باسه، باسێکی دوور و درێژه‌و و به تێر و ته‌سه‌لی له کتێبی «احیا»دا بێژراوه، به چه‌شنێک که له هیچ کتێبی‌تردا نه‌بێژراوه. له‌م کتێبه‌شدا هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی دێته گوتن که خه‌ڵکی فامی که‌ن. ئه‌مه‌ش له چوار به‌شدا راڤه ده‌کرێ:

**به‌شی یه‌که‌م**– خێر و وده‌می کاری حه‌ڵاڵ

**به‌شی دووه‌م** – ئاسته‌کاتی پارێزکاری له حه‌ڵاڵ و حه‌رامدا

**به‌شی سێهه‌م** – تۆژینه‌وه‌ی له‌سه‌ر حه‌ڵاڵ و هه‌ڵاواردنی له حه‌رام

**به‌شی چواره‌م** – په‌رای پادشا و خونکاران و چۆنییه‌تی تێکه‌ڵ بوون له گه‌ڵیان

### به‌شی یه‌که‌م – خێر و ودمی کاری حه‌ڵاڵ

په‌روه‌ردگار فه‌رموویه: «يا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّباتِ وَ اعْمَلُوا صالِحاً» واته، ئه‌ی پێغه‌مبه‌ران! بژیوی پاک بخۆن و ئاکار چاک بن. بۆیه پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووی: «بژیوی پاکژ و حه‌ڵاڵ فه‌رزه له‌سه‌ر هه‌موو موسوڵمانان». دیسان فه‌رمووی: «ئه‌وه‌ی چل رۆژ حه‌ڵاڵ بخوا و توخنی هیچ حه‌رامێ نه‌که‌وێ، په‌روه‌ردگار دڵی رووناک و لفتی ره‌وان و گفتی جوانی ده‌داتێ». له په‌یڤپکی‌تردا هاتووه که: «گراوی دونیای له دڵ ده‌سرێته‌وه».

---

[1] – لێڵی: شبهه.

[2] – به‌ده‌ست هێنانی بژیوی حه‌ڵاڵ له سه‌ر هه‌موو موسوڵمانێک پێویسته.

سەعد، لە یارانی نزیکی پێغەمبەر بوو. گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! دوعایەک بفەرمووو تا هەر دوعایەک کە من بیلێم گیرا بێ». فەرمووی : «خواردنی پاکژ و حەڵاڵ بخۆ تا هەموو نزایەکت گیرا بێ». پێغەمبەر فەرمووی: «زۆر کەسان خواردن و بژیو و جلوبەرگیان حەرامە، کەچی دەستیان بۆ دوعا و گازە هەڵدەبڕن: کەنگی دوعای ئەو کەسانە گیرا دەبێ؟» دیسان فەرمووی: «پەروەردگار فریشتەیەکی هەیە لە بەیتولموقەدەسدا، هەموو شەوێ بانگ هەڵدەبڕێ و دەڵێ: «ئەوی حەرام بخوا، پەروەرندەم نە فەرزی لێ وەردەگرێ و نە سوننەت». دیسان: «هەرکەس جلکێک بکڕێتە دە درهەم و یەک درهەم لەو پارەیە حەرام بێ، تا ئەو جلکەی دەبەردا بێ، هیچ نوێژی لێ وەرناگیرێ». هەروەها فەرمووی: «هەر گۆشتێ لە حەرام پێک هاتبێ، بۆ ئاوری دۆژەچاترە». هەروەها: «ئەوەی لە لای گرینگ نەبێ لە کوێ بژیوی دابین دەکا، پەروەردگاریش لە لای گرینگ نییە لە کوێوە بیخاتە نێو دۆژەهەوە. فەرمووی: «ئەوەی شەوان ماندووی بژیوی حەڵاڵ بێ و بگەڕێتەوە بۆ ماڵ، پەروەردگار لە گوناحانی خۆش دەبێ و کە بەیانی لە خەو رادەبێ خودا لێی خۆشە». پێغەمبەر فەرمووی: «عیبادەت دە بەشە، نۆ پاژی لە دابینکردنی بژیوی پاکژ و حەڵاڵە». هەروەها فەرمووی: «پەروەرندەم دەڵێ: «ئەوانەی توخنی حەرام نەکەون، لە رووم هەڵنایە لێیان بپرسمەوە». هەروەها: «یەک درهەم سوو (ربا)، گوناحترە لە سی جار زنا کە موسوڵمانێ تووشیاری بێ». دیسان: «ئەوەی ماڵی حەرام کۆوە دەکا، گەر بە سەدەقەی بدا، لێی وەرناگیرێ و گەر کۆی کاتەوە، دەبێتە دەستەچیلەی ئاوری جەحەننەم بۆی».

ئەبووبەکر لە دەستی خولامێکیەوە قومێ شیری خواردەوە. پاشان تێگەیشت لە رێی رەواوە دابین نەکراوە: قامکی بە قوڕگیدا کرد تا هەڵیهێنایەوە و وای لە خۆ کرد کەوتە شەرارەی مردن. پاشان گوتی: «پەروەرندەم! هانات دەبەمە بەر لەو رادەیە لە نێو دەمارەکانمدا ماوەتەوە».

عومەریش کاتێ بە هەڵە قومێ شیریان پێدا، هەروای کرد.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێ: «ئەگەر ئەوەندە نوێژ کەن کە پشتتان وەک کەمەی گۆچانی لێ بێ و ئەوەندە رۆژوو بن تا وەکوو تالەموویەکی باریکتان لێ بێ، تا خۆتان لە حەرام نەپارێزن هیچ کەڵکی نییە».

سەفیانی سووری گوتی: «ئەوەی لە ماڵی حەرام چاکە بکا و خێر و سەدەقە بدات، وەکوو ئەوەیە جلکێکی گلاو و پیس بە پیسایی بشوا تا پیستر دەبێ». یەحیای مەعاز گوتی: «بەندەگی و پەرستن، خەزانەی پەروەردگارە و کلیلی ئەو خەزانەیە دوعایە و پارووی پاکژ دیانەی ئەو کلیلەیە». سەهلی توستەری گوتی: «کەس ناگاتە راستەقینەی بڕوا مەگین بە چوار شت: سەر لە بەری فەرزەکان بە فەرز و سوننەتەوە بەجێ بێنێ، بە گوێرەی شەرع و پارێزکاری بژیوی پاکژ بخوا ، بە دڵ و بە رواڵەت

لە هەموو ناپاکییەک خۆ ببوێرێ و لەسەر ئەم کارانە بەردەوام بێ تا کاتی مردن».

گوتوویانە: «هەرکەس چل ڕۆژ بژیوی گوماناوی بخوا، دڵی ژەنگار دەگرێ و ڕەش دادێ». عەبدوڵلای موبارەک گوتی: «گەڕاندنەوەی یەک درهەمی گوماناوی بۆ خودانی، لە لام پتر لە سەد هەزار درهەمی سەدەقە هێژاترە».

سەهلی توستەری دەڵێ: «ئەوەی حەرام بخوا، ناچار حەوت ئەنامی تووشی گوناح دێ؛ خۆی بیەوێ یا نە. ئەوەش حەڵاڵ بخوا، هەموو ئەنامی خەریکی بەندەگی دەبێ؛ خۆ بیەوێ یا نەیەوێ». خەبەر و ئاساری زۆر لەم بابەتەدا هەیە، هۆکەشی ئەوەیە پارێزگاران زۆر چاودێری خۆیان کردووە. یەکێک لەمانە «وۆهەیبی کوڕی وەرد» بووە کە تا نەیزانیبێ خواردنی کە کوێڕا هاتووە، نەیخواردووە، ڕۆژێک دایکی پەرداخێ شیری پێ داوە، پرسیویە: «لە کوێت هیناوە؟ پارەت بۆ کڕینێ لە کوێ هیناوە؟» کە ئەمانەی زانی پرسی: «ئەم ئاژەڵە لە کوێ لەوەڕیوە؟». لەوەڕگاکە شوێنێک بوو کە مافی موسوڵمانانی بەسەردا بوو، گوتی ناخۆم. دایکی گوتی: «بیخۆ، پەروەردگار ڕوحمت پێ دەکا». گوتی: «هەرچەند دڵنیام، بەڵام نامەوێ؛ چونکە ئەودەم لە سۆنگەی دلۆڤانی پەروەردگارەوە تووشی گوناح هاتووم، من ئەمەم ناوێ».

لە بوشری حافی‌یان پرسی: «لە کوێڕا دەخۆی؟» گوتی: «لەو شوێنەی کە خەڵکی‌تر. بەڵام جیاوازی هەیە لە نێوان ئەو کەسەی دەخوا و دەگری، لەگەڵ ئەوەی دەخوا و پێدەکەنێ ». دیسان گوتی: «کەمتر لەوە نییە کە دەست کورتتر بێ و پاروو کەمتر».

## بەشی دووهەم – ئاستەکانی حەڵاڵ و حەرام

حەڵاڵ و حەرام ئاست و ڕادەیان هەیە و هەموویان یەک جۆر نین، هەندێ حەڵاڵە، هەندێ حەڵاڵی پاکژە و هەندێ پاکژتر. هەروەها حەرامیش هەروا: هەندێکیان ئەستەمتر و دژوارترن. هەروەکوو نەخۆشێ تینی بۆ خراپ بێ، ئەوەی گەرمتر و بە تینتر بێ، خراپترە و زیانی زۆرترە؛ گەرماش ئاست و ڕادەی جوراوجۆرە، هەر وەکوو چۆن هەنگوێن وەکوو شەکر نییە، حەرامیش هەروایە.

ڕادە و ئاستی موسوڵمانیش بۆ خۆپاراستن لە حەرام و شتی گوماناوی پێنجن:

**ئاستی یەکەم،** پارێزکارییەک کە هەموو موسوڵمانان لە سۆنگەی فتوای ڕواڵەتی شەرعەوە خۆ لەو حەرامەی بێژراوە لادەدەن: ئەمە کەمترین ئاستە. ئەگەر کەسێک ماڵی کەسێکی‌تر بە گرێبەستێکی نابەجێ لێی بستێنی، حەرامە؛ بەڵام ئەوەی کە بە زۆر ئەستاندبێتی، حەرامترە؛ ئەگەر لە سێوی[1] و

١. سێوی: هەتیو.

هەژاری سەندبێ، زۆر حەرامترە. گرێبەستی گەندەڵ چونکە هۆی ربا و سووە، حەرامیەکەی زۆرترە، هەرچەند بە هەموویان دەبێژن حەرام. ئەو شتەی کە زۆرتر حەرام بێ، مەترسی دوارۆژی زۆرترە و هیوای بوردنی کەمترە، هەر وەکوو ئەوەی نەخۆشێ هەنگوێن بخوا، مەترسی پتر لەو کەسەیە کە حەڵوا بخوا و کە زۆرتر بخوا، دیسان، مەترسی زۆرتر لەوەیە کە کەمتر بخوا.

شرۆڤەی ئەوەی کە حەرام کامە و حەڵاڵ کام، کەسێک دەیزانێ کە سەرلەبەری فیقهی چاک خوێندبێ. لەسەر هەمووان پێویست نییە هەمووی ئەوانە بخوێنین. چونکە ئەو کەسەی کە بژیوی لە ماڵی تاڵان و پیتاکی نامووسوڵمانان نەبێ، چ پێویستی بەوە هەیە کە کتێبی تاڵان و پیتاک بخوێنێ؟ بەڵام هەرکە لە سەریە ئەوەی پێویستی پێیە، فێری بێ: ئەگەر بژیوی بە مامەڵە دابین دەبێ، زانستی مامەڵەی لەسەر فەرزە، ئەگەر لە کرێکارییە، زانستی کرێ گرتن لە سەری فەرزە کە فێری بێ. هەر پیشەیەک زانستێکی هەیە و فێر بوونی ئەو زانستە بۆ ئەو کەسە فەرز و پێویستە.

**ئاستی دووهەم،** پارێزکاری پیاوچاکانە کە چاکەکاریان پێ دەڵێن. ئەمانەش بەم جۆرەن کە هەرچی موفتی بڵێ حەرام نییە، بەڵام لێی دڕدۆنگین، توخنی ناکەون و خۆی لێ دەبوێرن.

دڕدۆنگی سێبەشە: کەرتێکی وان کە دەبێ بێ سێ و دوو، توخنی نەکەون؛ هەندێکی فەرز نییە، بەڵام چاتر وایە لێی دوور بگرن؛ کەواتە لە فەرز دووری کردن هەوەڵە و لە موستەحەب دووهەم. بەڵام بەشی سێهەم ئەوەیە کە دوور لێ گرتنی وازوازییە و هیچ کەڵکی نییە؛ وەکوو ئەوەی کەسێک گۆشتی نێچیر نەخوا و بڵێ ڕەنگە ئەم نێچیرە هی کەسێک بووبێ و هەڵاتبێ»؛ یاخۆ خانوویکی بەکرێ گرتبێ و بێتەدەر و بڵێ «ڕەنگە خودانی ئەم خانییە بمرێ و ببێتە بەشی میراتبەران». ئەم شتانە، بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ ڕاستەو کا، وازوازین و بە کاری هیچ نایەن.

**ئاستی سێهەم،** پارێزکاری پارێزکارانە. ئەم تاقمە وان کە: گەر شتێک نە حەرام بێ و نە گومانی لەسەر بێ و پاک و پاراو حەڵاڵ بێ، بەڵام ترسی ئەوە هەبێ کە بە هۆی ئەو حەڵاڵەوە تووشی حەرام یان شوبهە بێن، خۆیانی لێ دەپارێزن و دووری لێدەگرن.

پێغەمبەر فەرمووی: «مرۆڤ ناگاتە ئاستی پارێزکاران مەگین ئەوەی لەو شتەی کە هیچ مەترسی حەرام بوونی تێدا نەبێ، بەڵام بووز بخوا ببێتە هۆی حەرام، دوورەپەرێز بێ».

عومەر گوتی: «ئێمە لە ترسی تووشی حەرام بوون، تەرکی نۆ بەش لە دە بەشی حەڵاڵمان کرد». لەم سۆنگەوە بوو کە کەسێک سەد دیناری لە لای کەسێ بایە،پتر لەنەوەد و نوێ نەدەسەندەوە.

«عەلی کوڕی سەعید» گوتی: خانوویەکم بە کرێ گرتبوو. نامەیەکم نووسیبوو، ویستم بە خاکی دیوارەکە ویشکی کەمەو. بە خۆم گوت: دیوار هی من نییە وانەکەم چاکە. دیسان بە خۆم گوت: ئەم ڕادەیە بایەخێکی نییە. نەختێ خاکم بەسەر نامەکەمدا کرد. لە خەودا دیم یەکێ پێی گوتم :

«ئەوانەی دەڵێن خاکی ئەم دیوارە چ بایەخێکی هەیە، سبەینێ لە ڕۆژی پەسڵاندا تێدەگەن».

ئەوانەی لەم ئاستەدا بن، لە هەر شتەکی زۆر بچووک و بێبایەخیش، خۆ لادەدەن؛ چونکە ڕەنگە ئەم ڕێگایە ئاوەڵاتر بێ و تووشی گوناحی گەورەتر بن و لە رادەی پارێزکاران بێنە خوارەوە.

حەسەنی کوڕی عەلی بە منداڵی لە ماڵی سەدەقە، خورمایەکی نایە سەر زاری، پێغەمبەر فەرمووی: «کخ‌کخ‌القها»؛ واتە قخ‌قخ! بیتفێنەوە!

یەکێک لە گەورەکانی رابردوو سەردانی نەخۆشێکی دەکرد؛ کە ئەمری خوای کرد، چراکەی کوژاندەوە گوتی: «میراتبەر لە ڕۆنی ئەم چرایەدا مافی هەیە».

عومەری خەتتاب میسکی غەنیمەتی لە ماڵەوە دانابوو تا خێزانی بیفرۆشێ بۆ موسوڵمانان: جارێک هاتەوە ماڵ، لە سەرپۆشی ژنەکەی بۆنی میسکی بیست، گوتی ئەمە چییە؟ گوتی «میسکم دەفرۆشت، دەستم بۆنی گرت، بەسەر پوشەکەمدا ساوی». عومەر سەرپوشی لە خێزانی سەند و دەیشۆرد و بە خاکیدا دەماڵی و بۆنی دەکرد، تا هیچ بۆنی لێ نەما، پاشان دایەوە پێی. ئەم رادەیە ئەوەندە بوو کە دەکرا چاوی لێ بنووقێنێ، بەلام عومەر ویستی تا ئەم درگایە هەر لێرە داخاو جارێکی‌تر دووپاتەی نەکاتەوە و لە ترسی تووشی حەرامبوون، چشی لە حەلاڵ کرد تا پاداشی پارێزکارانی وەبەرکەوێ. لە ئەحمەدی حەنبەلیان پرسی «یەکێک لە مزگەفتدایە و لە ماڵی سوڵتان بخوور دەسووتێنێ». گوتی: «دەبێ بێتە دەرێ تا بۆنی نەبیسێ. چونکە مەبەست لە بخوور، بیستنی بۆنە، لە حەرام گەلێک نزیکە و دڵنیا نین کە پەروەردگاری چاوپۆشی لێ دەکا یان نە».

عومەری خەتتاب ژنێکی بوو، زۆری خۆش دەویست. کە بوو بە خەلیفە تەلاقیدا، لە ترسی ئەوەی کە نەکوا لە کارێکدا تکاکار بێ و ئەمیش خوستی ئەوەی نەبێ «نەی» پێ بڵێ.

هەر ڕەوایەک کە بو چێژ و حەزی دونیا بگەڕێتەوە، لەم ریزەیە: کە پەرژایە سەریان، دەیخاتە نێو کێشەیەکی‌تر. تەنانەت، هەرکەس لە ماڵی حەلاڵ و ڕەوا و پاکژ تێر و تەسەل بێ، لە ئاستی پارێزکاران دێتە خوارەوە. چونکە تێرخواردنی حەلاڵ شاوەت دەبزوێنێ و دەیخاتە تەک و تۆی چێژ بردن. بۆیە ترسی ئەوەش هەیە خەریکی بیری نالەبار و تووشی ڕوانینی ناڕەوا بێ. ڕوانین بە ماڵ و باخ و کۆشک و تەلاری خەلک لەم چەمکەیە؛ چونکە ئەم، حەز بە دونیا دەبزوێنێ و دەیخاتە تەلوپۆ و تووشی حەرام دێ. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «حُبُّ الدُّنيا رَأسُ كلِّ خَطِيئه»، گراوی دونیا، سەرچاوەی هەمووگوناحانە. ویستنی دونیای حەلالیش، دڵ گیرۆدەی چێژ و خۆشی دونیا دەکا و زۆر خواستن لە دونیاش بێجگە لە تێکەڵ بوون دەگەڵ گوناح و تاوان پێک نایە، هۆی هەموو گوناحەکانیش ئاگابڕانە لە پەروەردگار.

جارێک سەفیانی سووری دەگەڵ برادەرێکی لە هەمبەر کۆشکێکدا تێپەڕا. برادەرەکەی لە

کۆشکەکەدا ورد بۆوە. سەفیان لۆمەی کرد و گوتی: «ئەگەر ئەنگۆ وا سەیری نەکەن، ئەمانە ئەوەندە زێدەڕۆیی ناکەن؛ کەواتە ئێوەش لەم گوناحەدا دەگەڵیان هاوبەشن». لە ئەحمەدی حەنبەلیان پرسی سەبارەت بە دیوار مزگەفت و خانوو سپیکردن. گوتی: «بۆ زەوی بووز دەخوا گەچی لێ بدرێ تا تۆز بەرز نەبێتەوە. بەڵام سپیکردنی دیوار، بۆ رازاندنەوەیە و لێی دڕدۆنگم».

گەورەکانی پێشوو گوتوویانە : «ئەوەی جلکی تەسک و ناسک بێ، دینەکەشی ناسکە.» بە کورتی ئەم بەشە چشکردنی حەڵاڵە بۆ تووش نەهاتن لە حەرام.

**ئاستی چوارەم**، پارێزکاری راسبێژانە، کە خۆیان لە حەڵاڵی دەپارێزن کە بۆی هەبێ هۆیەکی دەگەڵ گوناح تێکەڵ بووبێ. وەکوو ئەوەی «بوشری حافی» لەو کارێزەی خونکار هەڵیکەندبوو، ئاوی نەدەخواردەوە. تاقمێ لە رێگەی حەجدا لەو کانیاوەی پادشا دابوویەوە، ئاویان نەدەخواردەوە. تاقمێ لەو بێستانەی کە بە ئاوی جۆگەی هەڵکەندراوی پادشا، ئاودێری کرابوو، ترێیان نەدەخوارد.

ئەحمەدی حەنبەل، دروومان و مامەڵە لە مزگەفتی زۆر لە لا دزێو بوو. لێیان پرسی رات لەسەر ئەوەی لە سەرای گۆڕسانێکدا دووک دەڕێسێ چییە؟ لای ناحەز بوو و گوتی: «گوڕخانە بۆ دوارۆژە».

خولامێک چرایەکی لە ماڵی خونکار وەرگرت، خێوەکەی چراکەی کوژاندەوە و پەتی تایەک لە پێڵاوەکانی کرابۆوە و لەتاریکیدا دەڕۆیشتن و چرای سوڵتانیان پێ نەدەکرد تا پەتی پاڵاکەی ببەستێتەوە. ژنێک خەریکی دووکڕستن بوو، یەکێک کە چرای پادشای پێ بوو، بە لایدا رادەبورد. ژنەکە راوەستا تا ئەو چرا بڕوا و لەبەر رووناکی ئەو چرایە کار نەکا.

زونوونی میسری لە بەندا بوو. چەن رۆژ برسی بوو، هیچی نەدەخوارد. ژنێکی پارێزکار -کە موریدی بوو- خۆراکێکی پاکژ و حەڵاڵی بۆ نارد؛ هیچی نەخوارد. ئەو ژنە لۆمەی کرد و گوتی: «چادەزانی ئەوەی بۆتم نارد پاکژ بوو، تۆش برسی بووی بۆت نەخوارد؟» زونون گوتی: «چونکە لەسەر تەوقی ستەمکارێکەوە پێم گەیشت و لەسەر دەستی زیندانبان بوو». بۆیە خۆی لێ پاراست، چونکە ئەو خواردنە لەسەر دەستی ستەمکارێکدا بوو، ئەو ستەمکارە لە سۆنگەی خواردنی حەرامەوە هێز و وزەی بە دەس هێنابوو. ئەمە بەرزترین ئاستی پارێزکارییە.

ئەوەی بە تەواوی لەم راستیە نەگەیشتبێ، رەنگە تووشی وازوازی بێ و لە دەستی هیچ ستەمکار و خراپکارێک خۆراک نەخوا. وانییە کە ئەم حەرامبوونە تایبەت بە ستەمکار بێ و لە سۆنگەی حەرام خواردنەوە هێز و خوستی زوڵم کردن بە دەست هێنابێ؛ یا ئەوەی کە داوێن پیسە، هێزی زیناکردن لە خۆراکی حەرام بەدەس بێنێ.

سری سەقەتی دەڵێ: «رۆژێ لە دەشتێکدا کانیاوێکم بینی، گیایەکی لە تەنشتدا روابوو. گوتم: "ئەمە دەخۆم، رەنگە تا ئێستا حەڵاڵی وام نەخواردبێ". سرووشێ پێی گوتم: "ئەو هێزەی تا ئێرە

هێناتی لە کوێرا هاتووە؟" پەژیوان بوومەوە و لە گوناحم پاشگەز بووم». ئەمە ئاستی راسبێژانە کە ئاوەها ورد و درشت لێک دەکەنەوە. کەچی ئێستا بە ئاوەژووی ئەمەیە؛ خەلکی وان لە بیری دیتنەوەی ئاوی پاک و شوێنی چاک و بەرگی خاوێن، پێشوونان زۆریان گوێ بەمانە نەداوە و بە پێخاوس رۆیشتوون و لە هەر ئاوێ تارەتیان گرتووە. ئەو تارەتە، خاوێن‌کردن و خەملێنەری روانگەی خەلکە و هۆی خاپاندن و هەلفریواندنی موسولمانانە، کەچی ئەمیان، رازاندن و خەملاندنی دەروون و مەکۆ و سەیرانگای پەروەرێنەرمو لەوەی بێژرا، ئەستەمتر و دژوارترە.

**ئاستی پێنجەم**، پاریزکاری نزیکانی پەروەردگارە. ئەمانە هەرچی بۆ پەروەردگار نەبێ، لە خواردن و خەوتن و گوتن، نووکوبەدی بە حەرام دەزانن. ئەمانە تاقمێکی یەک هیممەت و یەک دانستەن و تاکپەرستی راستەقینە هەر ئەمانەن.

لە یەحیا کوری یەحیا دەگێرنەوە کە نەخۆش بوو و دەرمانێکی خواردبوو. خێزانی گوتی: «چەن هەنگاوێ هاتو چۆ کە». گوتی: «هۆیەک بۆ ئەم رۆیین نابینم، ئەمە سی سالە ئاگاداری خۆمم تا بێجگە بۆ دین نەبزوومەوە».

کەواتە ئەم تاقمە تا مەبەستێکی دینی نەبێ، هیچ نابزوونەوە؛ ئەگەر دەخۆن، پتر لەوەی ئاوەز و ژینیان بەردەوام بێ، ناخۆن؛ ئەگەر دەلێن بێجگە لە باسی رێی دین هیچ نالێن. بێجگە لەمە هەموو شتیان لە لا حەرامە.

ئەمەی بێژرا ئاستەکانی پارێزکاری بوو، ژبۆ ئەمە بوو تا لە خۆتدا رامێنی و لە ئاستی خۆت بگەی و خۆت بناسی و ئەگەر ویستت لە ئاستی یەکەم بی -کە ئەوە ئاستی پارێزکاری سەرجەمی موسولمانانە- تا لە ریزی لارێیان و رێ بزرکردووان نەبی.

لە خەبەردا هاتووە کە پێغەمبەر فەرمووی: «خراپترین کەسان ئەوانەن کە چاک دەخۆن و جوان دەبەر دەکەن و کاتی ئاخافتن، پەیڤی جوان دەلێن». پەروەردگار بە بەزەیی خۆی لەم تووش بوونەمان بپارێزێ.

## بەشی سێهەم- تۆژینەوە بۆ لێککردنەوەی حەلاڵ و حەرام

هەندێ وای بۆ چوون کە سەرلەبەری مالی دونیا حەرامە؛ یاخۆ زۆربەی حەرامە. ئەم کەسانە دەبنە سێ پاژ: ئەو تاقمەی کە بەبێ چاودێری و پارێزکاری نابزوونەوە گوتیان: «هیچ ناخۆین مەگین روەک و گیای دەشت و گۆشتی ماسی و راو». تاقمی دووەم کە شەیتان و شاوەت سواری کۆلیانە و دەلێن: «زۆر گرینک نییە و دەبێ لە هەموو شت بخورێ». تاقمی سێهەم کە لە میانەرۆیی نزیکترن گوتیان: «لەوەی پەروەردگار ئافراندوویە دەبێ بخوێن، بەلام بە گوێرەی نیازمان». هەر سێکی ئەم پەیڤانە

هەڵەن؛ راستەکەی ئەوەیە کە هەموو دەم حەڵاڵ و حەرام ئاشکران و لەم نێوانەدا لێڵی و دڕدۆنگیەک هەیە تا بە رۆژی پەسلان ئاشکرا نابێ ؛ هەر بەو جۆرەی پێغەمبەر فەرمووی.

ئەوەی پێی وایە مالی دونیا زۆرتری حەرامە، هەڵە دەکا؛ حەرام زۆرە بەلام زۆرتر نییە. «زۆر» و «زۆرتر» لێک جیاوازن، هەر وەکوو چۆن نەخۆش و مسافیر و سەرباز زۆرن، بەلام بەشی هەرە زۆری خەڵک نین. ستەمکار زۆرن، کەچی ستەم لێکراو زۆرترن. چۆنییەتی ئەم هەڵەیەمان لە کتێبی «ئەحیا»دا وەرد داوەتەوە.

راستیەکەی ئەوەیە وانەبێژراوە کە بێجگە لەوەی خودا بە حەڵاڵی دەزانێ، خواردنی شتیتر حەرامە؛ چونکە ئەوە لە ئاستی مرۆڤدا نییە. بەڵکوو بێژراوە: «ئەوەی بخۆن کە بە حەڵاڵی دەزانن و حەرامبوونی لێتان ئاشکرا نەبێ». ئەمەش بە سانایی دەست دەدا، بەڵگەش بو ئەم پەیڤە ئەوەیە کە پێغەمبەر لە مەشکەی موشریکێک دەسنوێژی شوردووە، عومەر لە گۆزەی ژنێکی مەسیحی تارەتی گرتووە. ئەگەر تینوو بووبێتن، ئاویان خواردۆتەوە و دیارە خواردنەوەی شتی ناپاک حەڵاڵ نییە و لە راستیدا دەستی ئەم کەسانە ناپاکە، چونکە شەراو و مرداری پێ دەخۆنەوە؛ بەلام چونکە شارەزای حوکمی پیسی نین، بە پیس نایەتە ئەژمار.

یارانی پێغەمبەر کە بە هەر شارێکدا رادەبردن خۆراکیان دەخوارد و مامەڵەیان دەکرد، هەر چەند لە سەردەمی ئەوانیشدا دز و جەردە و سووخۆر و مەیفرۆش زۆر بووە. دەستیان لە هەموو دونیا هەڵنەگرتووە و هەمووشیان بەرانبەر نەزانیوە. کەواتە دەبێ بزانی خەڵکی لە ئاست تۆدا شەش جۆرن:

**یەکەم**، ئەوەیە کە نەیناسی و چاک و خراپی لێت بەرپیوار بێ. هەر وەکوو لە شارێکدا نامۆ بی، رەوایە لە هەرکەس کە پێت خۆش بوو بژیو بکڕی و مامەڵەی لە گەڵ کەی، چونکە ئەوەی لە دەستی فرۆشیارێکدا بێ، وادیارە کە هی خۆیە و ئەمەش بۆت بەستە. بێجگە لە مامەڵەیەک کە بەڵگەیەک بۆ حەرامبوونی بە دەستەوە بێ، مامەڵەکەت بەتاڵ نابێ. بەلام ئەگەر کەسێک بەوە نەوەستێ و بگەڕێ بە دووی کەسێکدا کە لە چاکەکار بوونی ئارخەیان بێ، ئەمە لە ریزی پارێزکارییە، بەلام فەرز نییە.

**بەشی دووهەم**، ئەوەیە کە بە پیاوچاکی بزانی: خواردن لە مالی ئەم کەسە رەوایە و دڕدۆنگبوون بە پارێزکاری نایەتە ئەژمار، بەڵکوو بەمە دەڵێن وازوازی بوون. ئەگەر ئەو کەسە بە بۆنەی دڕدۆنگیتەوە لێت رەنجا، ئەو دڵئێشانە گوناحە و گومانی خراپ بردن لە مرۆڤێکی چاک، گوناح و تاوانە.

**بەشی سێهەم**، ئەو کەسەی کە بە ستەمکاری بزانی هەر وەکوو ترک یان دەست و پێوەندەکانی

پادشا، یا دڵنیابی کە بەشی هەرە زۆری سامانەکەی حەرامە: دەبێ خۆت لەو ماڵوسامانە بپارێزی؛ مەگەر دڵنیا بی لە شوێنێکی حەڵاڵەوە دەستی خستووە.

**بەشی چوارەم**، ئەو کەسەی کە دڵنیا بی زۆربەی هەرەزۆری ماڵی حەڵاڵە، بەڵام لە حەرام بێبەش نییە؛ وەکوو ئەوەی کە کابرایەک وەرزێر بێ، بەڵام ئەرکێکی پادشایی لە ئەستۆ بێ، یاخۆ بازرگانێک کە دەگەڵ خونکارێک مامەڵە دەکا، بەڵام زۆربەی ماڵوسامانی حەڵاڵە. شیاوتر ئەوەیە کە زۆرتر لەوەی وەربگرێ کە حەڵاڵە، بەڵام دوورگرتن لێی پارێزکارییەکی گرینگە.

بریکاری عەبدوڵڵای موبارەک لە بەسرەوە بۆی نووسی کە «دەبێ لەگەڵ کەسانێک مامەڵە کەم کە ئەوانیش دەگەڵ سوڵتان مامەڵە دەکەن، دەبێ چ بکەم؟» گوتی: «ئەگەر تەنیا لەگەڵ پادشا مامەڵەیان هەیە، لەگەڵیان مامەڵە مەکە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ کەسانیتریش پێوەندیان هەیە، دەتوانی مامەڵەیان لە تەکدا کەی».

**بەشی پێنجەم**، ئەوەیە کە نە لە ستەمی ئاگادار بی و نە لە ماڵی، بەڵام دروشمی ستەمکار بوونی لەگەڵ ببینی، وەکوو کڵاو و کەواو پۆشەنی دەسەڵاتداران. دەبێ لە مامەڵە لەگەڵ ئەم کەسانە خۆ بپارێزی، تا ئەوەی لێت خویان بێ ماڵوسامانیان لە کوێرا هێناوە.

**بەشی شەشەم**، ئەو کەسەیە کە نیشانەی ستەمکاری لە گەڵدا نەبینی، بەڵام دروشمی داوێن پیسی تێدا دیار بێ، وەکوو ئەوەی کە جلکی ئاوریشم لەبەر کا، شتمەکی زێڕین هەڵگرێ، بە راشکاوی مەی بخوا و چاو لە ژنان هەڵنەگرێ؛ چاتر وایە لە ماڵی ئەو کەسە دوور بگری، هەرچەند ئەم کارانە نابێتە هۆی حەرامکردنی ماڵ، بەڵام دەڵێن: «کە داوێن پیسی و خراپکاری بە حەڵاڵ زانی، رەنگە خۆشی لە ماڵی حەرام نەبوێرێ». بەگوێرەی ئەم بۆچوونە ناکرێ ماڵی کەسێک بە حەرام بزانرێ، چونکە کەس لە گوناح و تاوان بێوەر نییە و زۆر کەس هەیە کە خۆی تووشی ستەمکاری ناکا، کەچی تووشی گوناحیش دەبێ.

بۆ لێکهەڵاواردنی حەڵاڵ و حەرام، دەبێ چاومان لەم پێوەرە بێ کە ئەگەر تووشی حەرام بووی کەچی نەتزانی، چونکە نەتزانیوە و نەتناسیوە، لێت ناپرسنەوە؛ هەر وەکوو ئەوەی کە نوێژ خوێندن بە جلکی پیس، ناڕەوایە، کەچی ئەگەر پیساییەک بە جلکتەوە بوو و نەتزانی، تووشی لێپرسینەوە نابی و ئەگەر پاش ئەوە زانیت، لەسەر پەیڤێک پێویست نییە بیگێڕیەوە، چونکە پێغەمبەر لە نێوان نوێژدا شەکالی لە پێ دەرهێنا ونوێژی دووبارە نەخوێندەوە و فەرمووی: «جوبرەئیل ئاگاداری کردمەوە و گوتی پالاکانم ناپاکن».

ئاگادار بە لە هەر جێدا کە بێژرا: «پارێزکاری گرینگە، هەرچەند مەرج نییە»، رەنگە رەوا بێ لە خودانی ماڵ بپرسی لە کوێرا هێناویە، بەو مەرجەی لێت زیز نەبێ؛ ئەگەر خێوی ماڵ لە پرسیارەکەت

زیز بوو، ئەو پرسیارە حەرامە؛ چونکە پارێزکاری، چاودێرییە و دڵ ئێشاندن حەرامە. دەبێ بە ژیری و قسەی جوان و گفتی خۆش، خۆ لە خواردن لابدەی، ئەگەر پێت نەکرا، دەبێ بخۆی تا خاوەن ماڵ لێت قەڵس نەبێ. ئەگەر گەرەکت بوو لە کەسی‌تر بپرسی و ئەم پرسیارە دەگەیشتەوە گوێی خودانی ماڵ، ئەوەش حەرامە: چونکە ئەم کارە کۆڵینەوە و پاشملەگوتن و دڕدۆنگی لە خەڵکەو هەمووی حەرام و نارەوایە: بەبۆنەی چاودێرییەوە ئەم حەرامانە حەلال نابن. پێغەمبەر کە دەبووە میوان، نەیدەپرسی خواردنتان لە کوێرا هێناوە و کاتێ دیاریان بۆ دێنا نەیدەگوت ئەمە دیارییە یا سەدەقە؛ مەگەر لە شوێنێکدا کە گومانی تێدا بایە. سەرەتا کە ڕۆیشتە مەدینە، هەرچیان بۆی دەبرد دەیپرسی ئەمە دیارییە یا سەدەقە -چونکە جێی گومان بوو- لەم کارەش کەس زیز نەدەبوو.

ئەگەر لە بازاڕێکدا ماڵی خونکار بۆ فرۆتن ڕانرابوو، یا خۆ ئاژەڵی تالانیان دانابوو، گەر دڵنیا بووی کە زۆربەی ماڵی ڕانراوی ئەو بازاڕە حەرامە، نابێ هیچ بکڕی تا ئەوەی بپرسی و بزانی لە کوێ هێنراوە؛ بەڵام ئەگەر زۆربەی کاڵا و ماڵی ڕانراوی نێو ئەو بازاڕە، حەلال بوو، بێ‌پرس دەتوانی ئەوەی دەتەوێ بیکڕی: هەرچەند لێرەدا پرسینەوە، پارێزکارییەکی بەنرخە.

## بەشی چوارەم – وەرگرتنی مووچەی پادشایان و سڵاو لێ کردنیان،

هەروەها وەرگرتنی ئەو شتەی لە ماڵوسامانیان کە پاکژ و خاوێنە

ئەوەی بزانە، هەرچی لە لای پادشایان بێ، لە پیتاکی موسوڵمانان، یاخۆ تالان یان بەرتیل، هەمووی حەرام و ناپاکە.

ماڵی حەلال و پاکژی خونکار سێ جۆرە: سامانێ کە لە شەڕ دەگەڵ دوژمنانی خوادا دەستیان دەکەوێ، پیتاکێ کە لە دوژمنانی پەروەردگار دەگیرێ -بەو مەرجەی بە گوێرەی شەرع بێ- یا میراتییەک کە میراتبەری نەبێ و بکەوێتە دەس خونکاران تا بۆ کردنەوەی گرێ و گرفنچکی[1] ژینی خەڵکی چێژی لێ بگیرێ.

چونکە ڕۆژگار ئاوەهایە کە ماڵی حەلال و پاکژی خزمەتکاران زور دەگمەنە و بەشی هەرە زۆری لە ماڵی تالان و حەرام بەدەست هاتووە و نابێ هیچ لەمانە وەربگیرێن تا لە پاکژبوونی دڵنیا نەبێ، جا چ لە شەڕی کافراندا بەدەستی هێنابێ، یا لە پیتاک یا لە میرات.

پادشا دەتوانێ باخ و مەزرایەک ئاوەدان بکا و ئەوەش بۆی حەلالە. بەڵام ئەگەر کرێکاری بە بێگار گرتبێ، تەمی حەرامی لە دەور دەنیشێ، هەرچەند سوورسوور حەرام نەبێ. ئەگەر زەوی و زارێک

---

١. گرێ و گۆلی ژینی خەڵکی هەژار.

بکڕێ، دەبێتە ماڵی؛ بەڵام تەمی حەرام بوونی لەسەر نارەوێ.

ئەوەی لە خونکار مووچە وەردەگرێ: ئەگەر لە سامانی تایبەتی سوڵتان موچە دەستێنێ، پاک و حەڵاڵە؛ بەڵام ئەگەر لەو سامانەی کە دەبێ بۆ قازانجی گشتی بدرێ موچە بگرێ، پاکژ نییە، مەگین ئەوەی ئەو کەسە خێر و قازانجی بگاتە سەرجەمی خەڵکی؛ وەکوو مفتی و دادوەر و مەلاو پزیشک و سەرپەرشتی ماڵی گشتی.

بە کورتی ئەوەی بپەرژێتە سەر کارێ کە خێر و قازانجی بەسەر هەمووواندا ببارێ (وەکوو خوێندکار و هەژاری لە کار بێوەر) لەم ماڵوسامانە بەشی دەکەوێ. زانایان و کەسانیتر بەو مەرجەی بەش دەبەن، خوڵتە بۆ دەست و پەیوەندی پادشا نەکەن، سەر بۆ کردەوەی نابەجێ و نارەوای پادشا نەوی نەکەن، بە ستەمیاندا هەڵنەڵێن و تا بۆیان دەلوێ توخنیان نەکەون. ئەگەر کەوتن، دەبێ بە گوێرەی شەرع بێ و ئەو مەرجەش لە خوارەوە بە وردی وەرد دەدرێتەوە.

سەرنج- **هەڵسوکەوتی خەڵک دەگەڵ پادشا و دەست و پێوەندەکانی**

زانایان و خەڵکی لاوەکی پێوەندیان دەگەڵ خونکاران سێ چەشنە:

**یەکەم،** ئەوەی کە نە بڕواتە لایان و نە بێنە لای: چونکە دینی بەم جۆرە بێوەی دەمێنێ.

**دووەم،** ئەوەیە کە توخنی پادشا کەون و دروودی بۆ بنێرن؛ ئەمە لە دیندا بە توندی تووک و نزای لێ کراوە، مەگین کەسێک ناچار بێ؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس باری لە کن خونکاران نەخست، رەست: ئەوەش خستی، لە دەرد نەڕەست». دیسان فەرمووی: «پاش ئەمانە خونکارانی ستەمکاران. ئەوەی چاوی بەسەر زوڵم و زۆر و دزی و فزی و گزییان نووقاند، لە من نییە و هیچ رێ ناباتە سەر کانیاوی ئاوی ژینپرژێنی من». هەروەها: «دوژمنترین زانایان لە لای پەروەردگار، ئەوانەن دەواریان لە کن پادشایان هەڵداوە». دیسان: «هێژاترین پادشایان ئەوانەن کە پەرای زانایان دەکەن». دیسان فەرمووی: «زانایان ئەمانەتداری پێغەمبەرانن، با لەگەڵ دەسەڵاتداران تێکەڵ نەبن. کەتێکەڵ بوون، ئەمانەتدارییان بەجێ نەهێناوە، لێیان دوور بن و مەکەونە قەرەیان».

ئەبووزەر بە سەلەمەی گوت: «لە بارەگای خونکاران دوور کەوە، چونکە هیچ شتی بەنرختر لە ئیمانت دەست ناکەوێ». دیسان گوتی: «لە دۆژەهدا سارایەک هەیە کە بە تەنیا ئەو زانایانەی کلکەسووتەیان بۆ پادشایان کردووە، تێیدان». "عبادة بن الصامت" گوتی: «دۆستی زانیان لەگەڵ پادشایان نیشانەی دوڕوویەو دەگەڵ دەوڵەمەندان، نیشانەی زمان لووسی». ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «پیاو هەیە بە بڕوایەکی چاکەوە نزیکی دەسەڵاتداران دەبێ و بێبڕوا لێیان دادەبڕێ». گوتیان: «چۆن؟» گوتی: «بەڕازیکردنی ئەوان لە خۆی، پەروەندەی تووڕە دەکا». فوزەیل گوتی: «بەو رادەی

زانا لە خونکار نزیک دەبێ، لە پەروەرێنەری دوور دەکەوێ». وەهەب گوتی: «ئەو زانایانەی پەرای سوڵتان دەکەن، زیانیان بۆ خەڵکی پتر لە قومار بازانە».
محەممەدی کوڕی سەلەمە گوتی: «مێش لەسەر پیسایی مرۆڤ بەنرخترە لە زانای بەردەرگای سوڵتان».

**سەرنج**- هۆی ئەم توند گرتنە ئەوەیە کە هەرکەس کەوتە توخنی پادشایان، لە مەترسی تووش بوون بە تاوانایە، چ لە کردەوە و چ لە ئاخاوتن، چ لە بێدەنگی و چ لە بڕوا.

بەڵام *گوناح لە کردەدا* ئەوەیە کە، چونکە زۆربەی دەسەڵاتداران کۆشک و تەلاریان لە ماڵی خەڵکی بنیات ناوە، ڕۆیشتنە نێو ماڵیان ناڕەوایە؛ ئەگەر بۆ وێنە لە دەشت و سارا بێ، دەوار و ڕایەخیان حەرامە و پێ لەسەر نانی ناڕەوایە؛ ئەگەر لەسەر زەوینێکی ڕەوا بوو، نابێ لە لایان سەرنەوی کا، چونکە بەم چەشنە ستەمکارێکی ڕێز لێناوەو ئەمەش ناڕەوایە؛ تەنانەت لە خەبەردا هاتووە کە هەرکەس بەبۆنەی دەسەڵاتی دەسەڵاتدارێکەوە ڕێزی بگرێ -هەرچەند ستەمکار نەبێ- دوو خێر لە دینی فەوتاوە. کەواتە بێجگە لە سڵاو چیدی ڕەوا نییە. بەڵام دەس ڕامووسان و پشت چەماندن و سەر دانەوانن، ناڕەوایە، مەگەر ئەوەی بۆ پادشایەکی دادوەر یا زانایاکی خواناس یاخۆ کەسێک کە بە هۆی دیندارییەوە ڕێزی بگیرێ. هەندێ لە پێشوونان پەرسڤی سڵاوی ستەمکارانیان نەداوەتەوە، تا بەم چەشنە بە هۆی ستەمکارییانەوە سووک بکرێن.
بەڵام *گوناح لە پەیڤدا* ئەوەیە کە ناچار دەبێ دوعای بەخێری بۆ بکا و بڵێ : «پەروەردگار ژیان و بەختەوەریت پێ ببەخشێ»، ئەمەش ناڕەوایە؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی دوعای تەمەندرێژی بۆ ستەمکارێ کا، پێی خۆشە بەردەوام کەسێک لەسەر زەویدا نافرمانی خودا بکات». کەواتە هیچ دوعایەک ڕەوا نییە، مەگەر بڵێ : أَصْلَحَکَ اللهُ[1]، وفَّقَک اللهُ لِلْخَیْرات[2]، طَوَّلَ اللهُ عُمْرَکَ في طاعَتِه[3]. زۆربەی خەڵکی کە لە دوعا دەبنەوە، دەڵێن پێی شاد و شوکر دەبین کە پەرای سوڵتان کەین. ئەگەر ئەم پاپایەی لە دڵ نەبێ، تووشی درۆ و مەرایی بووە؛ ئەگەر تامازرۆ بێ، هەر دڵێ کە بە دیداری زاڵمان شادوشوکر بێ، لە نووری موسوڵمانی بێبەشە. کە لەمانەی بێژرا بووەوە، بە داد و

---

[1] - خودا بۆ چاکە هانت بدا.
[2] - خودا بۆ چاکەکاری سەرکەوتووت کا.
[3] - خودا ژینت لە خزمەت خۆیدا رابگرێ.

ئینساف و بەزەیی و دلۆڤان پەسنی دەکا و سەرجەمی ئەمانەش تەژی لە درۆ و مەرایی و دوڕوویین و لانی‌کەمی ئەوەیە کە دڵی بەردی ستەمکارێک بە پەسنی جوان، خۆش دەکا؛ ئەمەش گەلێک نالەبار و نابەجێیە. پاش ئەمە زۆرجار ئەو ستەمکارەی خۆ بەزلزانە، قسەی پڕ و پووچ و بێ‌سەروبن ئەکا و ئەمیش ناچارە وەکوو قمقمۆک هەر سەر بتەکێنێ؛ ئەمەش هەموو گوناح و تاوانە.

*گوناحی بێدەنگی*: لە کۆشکی پادشایاندا رایەخی ئاوریشین و رەسم و وێنەی ژنان و جلک و پۆشەنی هەورێشم و کلکەوانەی زێڕی و گۆزەی زیوین و ناوە بە ناوەش جنێو و قسەی نالەبار و درۆ و فیشاڵی بێ‌هەژمار لەسەر زاری شای ستەمکار دەبیسرێ و دەبینرێ و دەبێ بەرهەڵستیان بێ و پەلپی تێ بگرێ؛ بەلام لە ترسی زۆردار و لە دەسدانی سەروماڵ، دەبێ بێ‌ورتەو بێدەنگ و کپ بێ. رەنگە بۆی هەبێ لە ترسی گیان بێ‌دەنگ بێ، بەلام بۆی نییە بڕواتە شوێنێ کە چا دەزانێ کانی گوناح و سووچ و تاوانە.

*گوناحی دڵ‌و بڕوا*: رەنگە بە دڵ خۆشی بوێ و سەیری بکا و ریزی بگرێ و لە ماڵ‌وسامانی زور و زەوەندی، لە کۆشک و تەلاری ئاڵ‌و والا و جوانی وردبێتەوە و گراوی دونیای لە دڵ بێتە دی؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «ئەی ئاپۆرەی کۆچەران! توخنی خەڵکی دونیا مەکەون، چونکە لەو رزق و رۆزییەی پەروەردگار و پێی داون، تووڕە دەبن». عیسا گوتوویە: «لە ماڵ‌وسامانی خەڵکی دونیا رامەمێنن، چونکە رووناکی دونیایان، شیرینی ئیمانتان بەتالان دەبا».

کەواتە، دەبێ بزانی رۆیشتنە لای هیچ ستەمکارێ رەوانییە، مەگەر بە دوو هۆ: یەکەم بۆ ئەوەی لە لای سوڵتانەوە فەرمان دەرکرابێ بۆ رۆیشتنت، تۆش یا لە ترسی گیان یا لەبەر نەشکانی شان‌وشکۆی خونکار لە بەرچاوی خزمەتکارانی، بڕوا بە دەنگیەوە، یاخۆ بڕوا بۆ دادخوازی بۆ خۆی یا کەسی‌تر، یان تکایەک بۆ کەسێ کا. بۆ ئەم کارانە ئیزنی رۆیشتنە لای خونکاری هەیە، بەلام بەو مەرجەی درۆ نەکا، پەسن نەڵێ، بە توندی مووچیاری بکا، ئەگەر نەیوێرا، بە گفتی جوان و میهرەبان ئامۆژگاری کا، ئەگەر زانی مۆچیارییەکانی هیچ لێی کار ناکا، لە پەسنی درۆ خۆ ببوێرێ. کەسی وا هەیە کە خۆ هەڵدەکێشێ و دەڵێ دەڕۆم تکا بۆ فلان‌کەس دەکەم، بەلام ئەگەر کاری ئەو کەسە بە تکای‌کەسی‌تر رێکی هات، ئەم دلگیر و زیز بوو، ئەمە نیشانەی ئەوەیە رویشتنی بو لای سوڵتان پێویست نەبووە.

**سێهەم**: ئەوەیە نەڕواتە لای پادشایان، بەلام ئەوان بێنە لای، دەبێ کە خونکار سلاوی کرد، زانا وەرامی بداتەوە و ئەگەر رێزی لێ‌گرت و هەستایە سەر پێ، رەوایە و بۆی هەیە؛ چونکە سوڵتان بۆ رێزگرتنی زانستی زانا هاتووە و وەلامی پێویستە؛ هەر بەو چەشنەی پەرسڤی ستەم، بە گژدا چوونە. بەلام ئەگەر لە بەرپای خونکار هەڵنەستاو بەم چەشنە دونیا و دەست و پێوەندی سووک کرد، هێژاترە، مەگەر مەترسی ئەو هەبێ بۆ چاوترسانی خەڵکی و راگرتنی رێزی پادشا، ئازاری بدەن.

کە ڕۆنیشت، سێ ئامۆژگاری پێویستە: یەکەم ئەگەر خونکار پەرژاوەتە سەر کاری نالەبار، کەچی پێی وایە حەڵاڵە و هیچ تەگەرەی تێدا نییە، بۆی خویان و ئاشکرا کا؛ یاخۆ ئەگەر خەریکی کاری نابەجێ بوو، بۆ خۆشی ئاگای لە ژیانی بوو، کەچی گوێی خۆی لێ ئاخنی بوو، دەبێ لە ڕۆژی پەسڵانی بترسنێ، چاک و خراپی پێ بنوێنێ، پێی بڵێ: «دۆڕاندنی ژینی دوایی بۆ چێژ و حەزی دونیایی هەر زیانە، هەر خەسارە». سێهەم ئەگەر ڕەوت و شێوازێکی بۆ چاترکردنی ژینی خەڵکی لە دڵایە و پادشا لێی بێ ئاگایە و گەر بیزانێ دەیسەلمێنێ، پێی بنوێنێ.

ئەم سێ پەیڤەی کە هاتنە گوتن، پێویستن لەسەر زانایەک کە چاوی بە پادشا کەوت: هەڵبەت ئەگەر بیسەلمێنێ. ئەگەر زانا پارێزکار بێ، لە خواترس بێ، ژینی دوارۆژ بۆ ئەم دونیا نەدۆڕێنێ، زۆرجار هەیە پەیڤ و گفتی وەردەگیرێ. بەڵام ئەگەر تەنانەت بە سیلە چاوی بۆ کۆشک و سامانی سوڵتان ڕوانی، چاتر وایە کە هیچ نەڵێ، وس بێ، بێ دەنگ بێ، هەر بەو جۆرەی ڕۆیشت بگەڕێتەوە، چۆنکە بێجگە گەپچاڕ چیدی دەست ناکەوێ.

"مقاتل بن صالح" دەڵێ: «جارێ لە پەرای حەممادی کوڕی سەلەمەدا بووم. ماڵی چی! بێجگە کتێب و حەسیرێک و هەمانە و ئافتاوەیەک چیدی نەبوو؛ دەتگوت قەبرە، لەوەی هی دونیا بوو بێوەر بوو. یەکێک گوتی محەممەدی کوڕی سلەیمان هاتووە (خەلیفەی سەردەم) هاتە ژوورەوە و ڕۆنیشت و گوتی: "نازانم بۆچی، بەڵام هەرگا دەتبینم ترس دڵم دەگرێ؟" حەمماد گوتی: چونکە پێغەمبەر فەرمووی: "زانایەک کە مەبەستی لە زانین پەروەردگار بێ، دیتنی، ئەندێشە دەخاتە دڵی بینەران؛ بەڵام مەبەستی دونیا بێ و لە پشت پەردەی مەراییوە خۆی حەشاردابێ، لە هەمووان دەترسێ". محەممەد چل هەزار درهەمی نایە بەردەستی تا بەو چەشنەی خۆی دەزانێ خەرجی بکا. گوتی: "بیبەو بیدەرەوە بە خودانی". سۆندی بۆ خوارد لە میراتی حەڵاڵ بەرم کەوتووە. گوتی: "هیچ پێویستم پێ نییە". گوتی: "لە نێو موسوڵمانان و نەداراندا دابەشی کە". گوتی: "دەبێ بە داد دابەشی کەم؛ بەڵام ڕەنگە یەکێک بڵێ دادوەرانە راینەناوە، لە بەشکردندا دڵێ گۆڕاوە؛ چونکە تووشی گوناح دەبم، قەد نامەوێ" و لێی وەرینەگرت».

هەڵس‌وکەوتی زانایانی ڕاستەقینە، دەگەڵ خونکاران ئاوەها بووە. کە نزیکی پادشایان کەوتوون، وەکوو تاووس[1] کە ڕۆیشتە لای «هشام کوڕی عەبدولمەلیک» (خەلیفەی سەردەم) دەبزووتنەوە. کە هشام گەیشتە مەدینە، گوتی: «یەکێک لە یارانی پێغەمبەر بێرنە لام». گوتیان: «کەس نەماوە و گەڕاونەتەوە بەر بارەگای پەروەندەیان». گوتی کەسێک لە تابعینم لە بۆ بێنن. تاووسیان هێنا. کە

---

١- مەبەس :تاووس بن کیسانە.

ڕۆیشتە ژوورەوە، شەکالی دەرهێنا و گوتی: «سڵاوت لێ بێ ئەی هشام! چونی؟» پاشان لە شوێنێکدا بۆ خۆی ڕۆنیشت. هشام گەلێک تووڕە بوو، دونیای لە پێش تاریک بوو، شیری لە کێلان دەرهێنا، بەو مەبەستەی کە بیکوژێ، دەستوپێوەندی نەیانهێشت، پێکرا گوتیان: «ئێرە حەرەمی پێغەمبەرە و ئەم کابرایەش لە گەورەترین زانایانە، کوشتنی زۆر گێلانەیە». گوتی: «هۆی تاووس! بو سووکانە جووڵایتەوە؟» گوتی: «چم کرد؟» دیسان ئاوری تێبەربوو. گوتی: «چوار سووکایەتیت دەگەڵ کردم: یەکەم لە پێش من پاڵات دەرهێنا (ئەمە لە لایان ناحەز بوو، چونکە باو بوو کە لە لای خەلیفە پێڵاو نەکەنن)؛ دووهەم بە ناوی ئەمیرەلمۆئمنین بانگت نەکردم: سێهەم بە کەسناو[1] ناوت نەبردم (ئەمەش لە لای تات[2] گەلێک دزێوە) ؛ چوارم بە بێ ئیزنی من بۆ خۆت دانشتی و دەستی منت رانەمووسا». تاووس لە پەرسڤی خەلیفەدا گوتی: «ئەوەی کە شەکالم لە پێش تۆ داکەند، ڕۆژی پێنج جاران لە پەرای پەروەرندەی خۆم و هەمووان، پێڵاوی خۆم دەردەهێنم و هیچ زویر نابێ؛ پێتم نەگوت ئەمیرەلموئمنین، چونکە هەموو خەڵک بە ئەمیری خۆیانت نازانن، ترسام تووشی درۆ بم؛ ئەگەر بە ناوی خۆت دەگەڵت ئاخاوتم نە کەسناو، لەو سۆنگە بوو پەروەردگار، دۆستانی خۆی بە ناوی خۆیان بانگ کردووە، هەر وەک دەڵێ: ئادەم، حەووا، داوود، یەحیا، مووسا و عیسا، کەچی هەموو دوژمنانی بە ناوی کەسناو ناسیوە وەکوو دەڵێ: تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ[3]؛ بەڵام ئەوەی کە دەستتم رانەمووسی، لە ئەمیرەلموئمنین عەلیم بیست کە دەستی کەس رامەمووسن، مەگەر دەستی ژن بۆ شاوەت و دەستی منداڵتان بە رەحمەت؛ ئەوەش کە لە پێشت دانیشتم، لە ئەمیرەلموئمنین عەلی ژنەفتم کە ئەگەر ویستت کەسێکی دۆژەهی ببینی، سەیری پیاوێک کە کە دانیشتووە و دەست و پێوەندی راوەستاون». هشام زۆری حەز پێ کرد، گوتی ئامۆژگاریم کە. گوتی: «لەعەلیم بیست کە گوتی: "لە دۆژەهدا مار هەیە، هەر یەک بە قەدەر کێوێ، دووپشک هەیە، هەر یەک بە رادەی چەن حوشتر، ئەمانە چاوەنۆڕی ئەو خونکارانن کە دادوەرانە دەگەڵ خەڵکی نابزوێنەوە"». ئەمەی گوت و هەستاو ڕۆیی.

سلەیمانی عەبدولمەلیک خەلیفە بوو، کە گەیشتە باژێری مەدینە، تامازرۆی دیتنی ئەبووحازم بوو. ئەبووحازم لە زانایانی بەناوودەنگ بوو. لێی پرسی: «بۆچە مردنمان لەلا ناحەزە؟» گوتی: «چونکە دونیای خۆتت ئاوەدان و دوارۆژت کاول کردووە. ئەوەش بیەوێ شوێنی ئاوەدان بەجێ بێنێ و روو لە ماڵی کاول کا، رەنج بە خەسار و چاو بە گریان و دڵ بە بوریانە» پرسی: «دەبێ حاڵی ئەو خەڵکەی

---

[1] - کەسناو: کنیە.

[2] - تات: عارەب.

[3] - (قورئان، ١/١١١)

بەرەو بارەگای پەروەندەیان دەڕۆن، چۆن بێ؟» گوتی: «چاکەکاران وەکوو ئەو کەسەن لە سەفەری دوور و درێژ دەگەڕێتەوەو بەدیتنی خۆشەویستان شاد و شوکر دەبێ؛ بەڵام خراپکاران وەکی کۆیلەیەکی هەڵاتوون، کە گیرابێ و بیگێڕنەوە لای خودانی تووڕە و بەزەبری». گوتی: «بریا! دەمزانی حالی من چۆنە». گوتی: «خۆت بە قورئان هەڵسەنگێنە تا بزانی کە دەڵێ: إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ، وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ[1]». گوتی: «کەواتە بەزەیی پەروەردگار چی لێ دێ؟ » گوتی: «انَ رَحْمَةَ اللهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحسنين»؛ واتە: بەزەیی خودا دەگەڵ چاکە کارانە.

پەیڤی زانایان دەگەڵ پادشایان ئاوەهایە. زانایانی دونیایی، بە زمان لووسی و مەرایی، دەگەڵ خونکاران ئاخاوتوون، بە نیاز بوون شتێک بڵێن، جێی سەرنجی زاڵمان بێ، پەیڤی ئەوان بسەلمێنن، تا لەم ناوەشدا خێر و قازانجێکیان دەس کەوێ.

بە هەر جۆر کە بێ، نەدیتنی ستەمکاران هێژاترە، تێکەڵ نەبوون لەگەڵیان چاترە، تەنانەت لەگەڵ ئەوانەش خزمەتی ستەمکاران دەکەن، نزیک نەبێ زور باشترە؛ ئەگەر یەکێک نەتوانێ لە ستەمکاران دووری بگرێ، چاتر وایە خۆی بزرکا، لە خزم و کەسیش خۆی گوم بکا.

پێغەمبەر فەرمووی: «ئەم ئوممەتە بەردەوام لە ژێر چاودێری و لە پەنای پەروەردگارایە، تا ئەوەی کە زانایانی دەگەڵ خونکاران تێکەڵ دەبن». بە کورتی، هۆی خەسار و زیان و تاوانی خەڵکی، پادشایانن و زیانی خونکارانیش لە سۆنگەی زانایانە؛ چونکە ئامۆژگاری پادشایان ناکەن و خۆ لە پەڵپ و پلار تێگرتنیان لادەدەن.

**سەرنج**- مەرجەکانی وەرگرتن و ئەستاندنی ماڵ لە خونکاران

کە خونکارێک پارەو دراوێ بنێرێتە لای زانایەک تا بۆ کاری چاکە خەرجی کا، ئەگەر زانا دڵنیا بوو لەوەی کە ئەم سامانە، هی کەسێکی تایبەتە، نابێ قەد توخنی کەوێ؛ بەڵکوو دەبێ بڵێ بیگێڕەوە بۆ خودانی؛ ئەگەر خێوی خویان نەبوو، هەندێ لە زانایان لە وەرگرتنی خۆیان بواردووە؛ من خۆم پێم وایە، چاتر ئەوەیە لێیان وەربگرێ و بۆ کاری چاکە خەرجی کا، تا لە دەستی خونکاران دەربێ و نەبێتە ئامرازێ بۆ ستەمکردن و هەژارانیش نەختێ بحەسێنەوە. دەبێ ئەم ماڵە بگەینێتە دەستی هەژاران، بەڵام بە سێ مەرج.

**مەرجی یەکەم**- لە سۆنگەی ئەستاندنی ئەم ماڵەوە، پادشا پێی وانەبێ ماڵوسامانی پاک و حەڵاڵە؛

---

[1] - (قورئان، ٨٢/ ١٣-١٤) بێ‌گومان ئاکار چاکان لە خۆشیدان، بەدکارانیش جەهەندەمین. (هـ)

چونکە ئەگەر وانەبوایە، لێی نەدەگرت و وەریدەگێڕایەوە؛ چونکە ڕەنگە بۆ کۆوەکردنی ماڵی حەرام سوورتر بێ و زیانی ئەمەش پتر لە خێر و قازانجیە.

**مەرجی دووەم**- ئەوەیە کە وانەبێ خەڵکی بۆ وەرگرتنی سامان لە خونکاران چاو لەم زانایە ببڕن و پێڕەوی لێ بکەن، بەڵام گوێ بە دابەشکردنی نەدەن. وەکوو تاقمێ کە دەیانگوت ئیمامی شافعی ماڵی پادشایانی وەردەگرت؛ لەمە بێئاگا بوون کە سەرلەبەری ئەو سامانەی لە نێو خەڵکیدا دابەش دەکرد. وەهەبی مونەببە و تاووس پێکرا لە لای برای حەججاج بوون. بەرەبەیان بوو و کزەی سەرما ئیسقانی دەتەزاند. تاووس خەریکی مووچیاری بوو؛ برای حەجاج دەستووری دا باڵاپۆشێکیان بەسەرشانی تاووسدا دا. تاووس قسەی دەکرد و خۆی دەلەراندەوە تا باڵاپۆشەکەی داکەوت. برای حەجاج بەم کارانەی زانی، گەلێک لێی زویر و تووڕە بوو. کە هاتنەدەر، وەهەب گوتی: «تاووس ئەگەر ئەو باڵا پۆشەت وەرگرتایە و بتدایەتە هەژارێ، چاتر لەوەی بوو کە ئەو لە خۆت زیز کەی». گوتی: «دڵنیا نەبووم لەوەی کە کەسێکیتریش چاو لە من ببڕێ و ماڵی ستەمکاران وەربگرێ و نەزانێ من داومە بە هەژارێ».

**مەرجی سێهەم،** ئەوەیە کە نابێ ببێتە دۆست و برادەری زۆردار، بە بۆنەی ئەو سامانەی بۆ دابەشکردن بۆی ناردووە. دۆستی دەگەڵ ستەمکاران، زیانی زۆری لە دووە؛ وەکوو تووش بوون بە مەرایی و دووزمانی، زیز بوون لە سۆنگەی مردن و نەمانی پادشا و شاگەشکە بوون بە هۆی زۆروزەوەندە بوونی ماڵوسامان و دەسەڵاتی. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەندەم! هیچ ستەمکارێ بۆی دەست نەدا چاکەم دەگەڵ کا؛ تا دڵی من بەرەو لای خۆی ڕانەکێشێ». ئەمەی بۆیە گوت چونکە دڵ بە ناچار بادەداتەوە لای ئەم کەسەی چاکەی لەگەڵ کردووە. پەروەردگار دەڵێ: وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ [١].

یەکێک لە خەلیفەکان دە هەزار درهەمی نارده کن مالکی دینار. هەمووی دابەش کرد و هیچی لێ گل نەدایەوە. محەممەدی واسیع چاوی پێکەوت و گوتی: «ڕاستی بڵێ، هیچ خۆش ویستنێکی ئەو خەلیفەت لە دڵ پێک هات». گوتی: «پێک هات». گوتی: «هەر لەمە دەترسام. بەدفەڕی ئەو سامانە لە دڵتدا کاری خۆی کرد».

یەکێک لە گەورەکانی بەسرە ماڵی سوڵتانی وەرگرت و دابەشی کرد، لێیان پرسی: «نەترسای خۆشویستنی پادشایان لە دڵتدا بێتە دی؟» گوتی: «ئەگەر کەسێک دەستم بگرێ و بمباتە نێو بەهەشتەوە و پاشان گوناح کا، دەبێ بە دوژمنی بزانم؟ یان بە بۆنەی پەروەردگارەوە کەسێک بە

١- (قورئان؛ ١١/ ١١٣) ڕووەدەی ئەوانە مەبن غەدرێ دەکەن: دەنا بە ئاگر دەسووتێن. (هـ)

دوژمن بزانم کە دەستی گرتووم و بردوومیەتە نێو بەهەشتەوە، ڕەوایە؟» کەسێک ئەوەندە دڵاوا بێ و هێزی دڵی پێ درابێ بۆی هەیە ماڵوسامانی ستەمکاران لێیان بستێنێ و دابەشی کا.

## بنەمای پێنجەم – بەجێ هێنانی مافی پێوەندی دەگەڵ خەڵک
## و
## بەجێهێنانی مافی خزم و جیران و کۆیلە و هەروەها بەجێهێنانی مافی هەڤاڵان و هەژاران و برایان بۆ رەزای خودا

دونیا هەوارێکە لە هەوارەکانی ڕێگەی خودا؛ هەمووان لەم هەوارگەدا ڕێبوارن. لەم ڕێگایەدا چونکە دوایین مەنزڵگا یەکێکە، کاروانی مسافرەکانیش وەکوو یەکن: دەبێ یەکتریان خۆش بوێ و ئاریکارو یەکدڵ بن و مافی یەکتری ڕابگرن. بۆیە مافی پێوەندی دەگەڵ خەڵک لە سێ بەشدا شرۆڤە دەکرێ:

بەشی یەکەم – دۆستی و برادەری بۆ خودا،

بەشی دووەم – مافی هەڤالان،

بەشی سێهەم – مافی موسوڵمانان و خزم و کریڤ و کوێلە.

### بەشی یەکەم – دۆستی و برادەرییەک کە بۆ خودا بێ

دەبێ بزانی کە دۆستی و برادەری بۆ ڕەزای خودا، لە هێژاترین عیبادەتەکانە و ئاستێکی بەرزی لە دیندا هەیە. پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەردگار بیەوێ چاکەیەک دەگەڵ هەرکەس کا، دۆستێکی هێژا و لەباری دەداتێ، تا ئەگەر پەروەردگاری لە بیر کرد، بیخاتەوە بیری و ئەگەر یادی پەروەرندەی کرد، ببێتە هاوڕێی». دیسان فەرمووی: «دوو بڕوادار کاتێ پێک دەگەن، خێرو قازانجیان بە دینی یەک دەگا». هەروەها گوتی: «ئەوەی لە ڕێی پەروەردگاردا لەگەڵ کەسێک ببێتە دۆست، لە بەهەشتدا پلەیەکی بەرزی دەدرێتێ، کە بە هیچ کردەوەیەکی‌تر بەو ئاستە ڕاناگا». ئەبوو ئیدریسی خولانی بە مەعازی گوت: «بە بۆنەی پەروەردگارەوە زۆرم خۆش دەوی». گوتی: «مزگێنی بێ کە لە

پێغەمبەرم بیست کە ڕۆژی پەسلان، لە دەور تا دەوری عەرشدا کورسی داچنراوە بۆ کەسانێک کە ڕوومەتیان وەکی هەیڤی چاردە دەدرەوشێتەوە. سەر لە بەری خەڵکی دەترسن، کەچی ئەوان هێمنن، هەموو خەڵکی بێ ئۆقرەن، کەچی ئەوان ئارخەیانن. ئەمانە یارانی خودان کە نەدەترسن و نە خەم دایاندەگرێ. پرسیاریان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانە کێن؟ فەرمووی: "المُتحابّونَ في الله"؛ ئەمانە کەسانێکن کە بۆ ڕەزای خودا یەکیان خۆش ویستووە».

پێغەمبەر فەرمووی: «دوو کەس کە یەکتریان بۆ خاتری خودا خۆش دەوێ، هێژاترینیان لە کن پەروەردگار ئەوەیە کە ئەویتری خۆشتر بوێ». دیسان فەرمووی: «پەروەرندەی دلۆڤان دەڵێ: بە ڕاستی خۆشم دەوێن ئەو کەسانەی کە بۆ خاتری من، سەردانی یەک دەکەن، یەکیان خۆش دەوێ و لە ماڵی خۆ بۆ یەکتری بەخت دەکەن و ئاریکاری یەکترن، هەمووی لە بۆ ڕەزای من». دیسان گوتی: «پەروەردگار لە ڕۆژی پەسلاندا دەڵێ: لە کوێران ئەو کەسانەی بۆ خاتری من دۆستی یەک بوون، تا ئەمڕۆ کە هیچ سێبەرێ نابێتە داڵدەی کەس، لەسای خۆمدا رایانگرم؟» دیسان گوتی: «ڕۆژی پەسلان کە هیچ سێبەرێ نییە، حەوت کەس لە سای پەروەردگارن: پێشەوای دادوەر، گەنجێ کە لە سەرەتاوە بەندەی خودا بووبێ، پیاوێ کە لە مزگەفت دێتەدەر، دڵی لە مزگەوتایە تا دەگەڕێتەوە؛ دوو کەس کە بۆ خاتری پەروەردگار ببینە دۆستی یەک و بڕۆنە لای یەک و لە یەک جیابنەوە؛ کەسێ کە لە تەنیایی خوێدا یادی خودا کا و چاوی تەڕی ئەسرین بێ؛ پیاوێ کە ژنێکی خوشیک و جوان و لەبار مەیلی پێ بدا و بانگی بکا، کەچی ئەو پیاوە بڵێ من لەترسی پەروەرندەم توخنت ناکەوم؛ ئەویتریان ئەو کەسەیە کە بەدەستی ڕاست چاکەو خێر بکاو دەستی چەپی پێی نەزانێ». هەروەها گوتی: «ئەوەی بۆ ڕەزای خودا سەردانی هەڤالی کا، فریشتەکان هاوار دەکەن کە بەهەشتت لێ پیرۆز بێ».

فەرمووی: «پیاوێ بۆ سەردانی برادەرێکی دەچوو. پەروەردگار فریشتەیەکی ناردە سەر ڕێی لێی بپرسێ بۆ کوێ دەچێ؟ گوتی بۆ سەردانی فلان برادەر. پرسی: کارێکت پێیە؟ گوتی: نە. پرسی: خزمایەتیت دەگەڵی هەیە؟ گوتی: نە. پرسی: چاکەی دەگەڵ کردووی؟ گوتی: نە. پرسی: کەواتە بۆ دەڕۆی؟ گوتی: لەبۆ خودا خوشیم دەوێ. گوتی: پەروەرندەم منی ناردە لای تۆ تا مزگێنیت پێ بدەم کە پەروەردگارت خۆشتی دەوێ، چونکە ئەنگۆ یەکتان دەوێ و بەڵێنی بەهەشتی پێ داون». پێغەمبەر فەرمووی: «بەهێزترین نیشانەی بڕوا، دۆستی و دوژمنایەتییە بە بۆنەی خودا».

پەروەردگار وەحی نارده سەر هەندێ لە پێغەمبەرانی و پێ گوتن: «بەم پارێزکاری و دوورەپەرێزیەتان، خۆتان لەدەردی دونیا ئاسوودە کرد؛ ئەوەی بەم چەشنە پەرژایە سەر عیبادەتی من خۆی هێژا کرد، بەڵام چاک ڕامێنەو بزانە قەد ژبۆ من دۆستانمت خۆش ویستووەو ڕقت لە

دوژمنانم بووە؟»

پەروەردگار بە عیسای گوت: «ئەگەر سەرلەبەری عیبادەتەکانی جیهان بەجێ بێنی، کەچی بۆ من دوژمنی و دۆستی نەکەی، هیچ کەلکی نییە». عیسا گوتی: «بە دوژمنی دەگەڵ دوژمنان و سەربزیوان لە هەمبەر خودا، دەگەڵ پەروەرندەتان ببنە دۆست. بە دوور گرتن لە لارێیان لە خودانی خۆتان نزیک کەون، بە تووڕەبوون لە ستەمکاران، بەزەیی خودا بۆخۆ بکڕن». لێیان پرسی: «ئەی رۆحی خودا! لەگەڵ کێ دابنیشین؟» گوتی: «دەگەڵ کەسێک کە پەروەردگارتان بخاتە بیر، پەیڤی ئەم کەسانە زانیاریتان پتر دەکاو هەڵس‌و کەوتیان مەیل و حەزتان بەدوارۆژ فرەتر دەکا».

پەروەردگار بە داوودی فەرموو: «ئەی داوود! بۆ لە خەلکی دوورەپەرێزی؟» گوتی: «پەروەرندەم! دۆستایەتی تۆ یاد و خۆشەویستی خەلکی لە دڵ سڕیم». گوتی: «ئەی داوود! ئاگادار بەو برادەری چاک بۆ خۆ ببینەوە، ئەوەی نەبووە یاریکارت لە رێگای دین، لێی دوور کەوە، چونکە دڵت رەش و مەیلت کەم دەکا».

پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەردگار فریشتەیەکی هەیە، نیوەی لە ئاور و نیوەی لەبەفرە. دەڵێ پەروەردگار، هەروەکی چۆن ئاور و بەفرت پێکڕا نووساند و ئاشتت کردنەوە، دڵی بەندە چاکەکانت لێک نزیک کە». دیسان فەرمووی: «ئەوانەی بۆ رەزای خودا یەکیان خۆش بوێ، ئەستوونێک لە یاقووتی سوور بۆیان هەڵدەدرێ کە حەفتا هەزار کۆشکی لە سەرە. لەوێڕا بۆ خەلکی بەهەشت دەنوارن و نووری روومەتیان وەکوو رووناکی هەتاو لە دونیا، بەسەر خەلکی بەهەشتدا دەدا. بەهەشتییەکان دەڵێن: "وەرن با سەیری ئەمانە کەین". دەیانبینین کە جلکی سندووسی کەسکیان دەبەرەو لەسەر جەمینیان نووسراوە "المتحابون فی الله"؛ ئەمانە دۆستانی خودان». کوڕی سەمماک لەگیانەلادا بوو، دەیگوت: «پەروەرندەم! خۆت دەزانی لەو کاتەدا کە تووشیاری گوناح دەبووم، پەرستێنەرانی تۆم خۆش دەویست؛ ئەو خۆش‌ویستنەم بکەرە کەفارەی گوناحەکانم». موجاهید دەڵێ: «کاتێ دۆستانی پەروەردگار بە رووی یەکدا پێدەکەنن، وەکوو داوەرینی گەڵای داران، گوناحەکانیان دادەوەرێن».

**لێکدانەوەی راستەقینەی دۆستی پەروەردگار**- ئەوە بزانە گەر بە هەڵکەوت لە قوتابخانە، یان سەفەر یا خۆ گەڕەک دەگەڵ کەسێک بوویتە برادەر و خۆشەویستیەک لە نیوانتاندا هاتەدی، یا خۆ ئەگەر کەسێکت لە سۆنگەی گفتی جوان و پەیڤی شیرین و روومەتی خوشیکەوە خۆش‌ویست، ئەوە خۆشویستنە ناڕواتە ریزی دۆستایەتی خوداوە. هەروەها ئەو کەسانەش کە خێرو قازانجێکی دونیاییت پێدەگەینن، لەم تاقمە نین. چونکە ئەمانە بۆیان هەیە هیچ بڕوایەکیان بە خودا و پەسلان نەبێ؛

دۆستایەتی پەروەردگار تەنیا بە هۆی برواوە پێک دێ و لە دوو ئاستدایە:

**یەکەم**: کەسێکت خۆش بوێ بەم بۆنەوە کە خێرو قازانجێکت لە پەسلاندا پێدەگەینێ: وەکوو ئەوەی مامۆستای خۆت خۆش دەوێ، چونکە زانیاری دوارۆژت پێ فێر دەکا، نەک بە بۆنەی گەیشتن بە پلەو پایەی دونیاوە؛ گەر وانەبوو، واتە بۆ دونیا بوو، نارواتەریزی دۆستایەتی خوداوە.

ئەگەر هۆی خۆشویستنی شاگردەکەت ئەوەیە کە خودا لەوەی کە کەسێکیتر رادێنی لێت خۆش دەبێ، ئەوە گەلێک بە ودمە؛ چونکە هۆی خۆشەویستیەکە پەروەردگارە؛ کەچی ئەگەر ژبۆ پلەو پاگەی دونیایی بێ، هیچ پوولێ ناکا. ئەگەر کەسێکی خۆش بوێ لەبەر ئەوەی چاکە دەکاو خێری بە هەژاران رادەگا و نەداران بانگهێشتن دەکاو خواردنی خۆشیان بۆ چێ دەکا، ئەوەش لەبەر خودایەو گەلێک لە لای هێژایە. یا خۆ ئەگەر عابیدێ دارایەکی خۆش بوێ لەبەر ئەوەی بژیوی بۆ دابین دەکاو رەنجی کاری لە کۆڵ دەخا، تاکوو بە ئارخەیانی بپەرژێتە سەر عیبادەت و پەرستنی پەروەردگار، ئەو دوانەش بەدۆستی خودا دێنە هەژمار.

هەروەها ئەوەی ژنەکەی خۆی خۆش بوێ، چونکە لە تووشبوون بە گوناحی دەپارێزێ و منداڵی بۆ دێنێ تا پاش مردن لە دوعای خێری بێبەش نەبێ، ئەوەش هەر لە بۆ خودایەو هەرچی بۆ خەرجی پێیان بدا، هەمووی بەخێر و سەدەقە بۆی دەنووسرێ. ئەگەر کەسێک شاگردی خۆی خوەش گەرەک بێ بە دوو بۆنەوە: یەکەم ئەوەی پەرای دەکاو دووهەم ماوەی زۆرتری بۆ دەرەخسێ تا بپەرژێتە سەر عیبادەت و بەندەگی خودا، ئەوەی کە بۆ عیبادەت بێ، دەرواتە ریزی دۆستی خودای دەهندەو دلۆڤانەوەو خێری زۆروزەوەندەیە.

**ئاستی دووهەم**: ئەم یەکەیانە گەورەترە. ئەوەش خۆشویستنی کەسێکە لەبەر رەزای خودا، بەبێ هیچ چاوەڕوانی و مەبەست و نیازێ؛ بەڵکوو تەنیا لە سۆنگەی ئەوەی کە ئەو کەسە بەندەو گوێڕایەڵی پەروەردگارەو خۆشەویستی بینایی چاوانە؛ یاخۆ چونکە بەندەو ئافرێندراوی دەستی خودایە. ئەم دۆستیایەتییە خودابیە. ئەمە گەلێ مەزنترە، چونکوو تەنیا هۆی ئەم خۆشویستنە ڤیان و گراوی پەروەردگارە؛ لە راستیدا ئەوەی گراوی کەسێک بێ، کە ئەوینی لە تخووبی[1] ئاوەز تێپەڕا، وای لێ دێ کە هەرچی پێوەندی بە خۆشەویستیەوە بێ، لای خۆشەویستە؛ داروبەرد و ماڵ و خانوو و دەرک و دیوار و دەلاقەی ئەو گەرەکەی خۆش دەوێ؛ تەنانەت سەگی بەردەرکی گراوەکەی پتر لە سەگانیتر خۆش دەوێ. ئەوەی کۆیلە و بەندە و خزمەتکار و گوێڕایەڵی دلداری بێ، جێگای لە سەرسەری ئەمە و ئەوەی بە هەر هۆیەک بەندیوارییەکی بە دلداریەوە بێ، لای خۆشەویستەو

---

١. تخووب: سنوور.

هەرچەندە گراوپەکەی زۆرتر بێ، خۆشەویستی داروبەردی کۆڵانەکەیان زۆرترە.

ئەوەی تووی دۆستایەتی پەروەردگار لە دڵیدا چێنرابێ، تا ئەوەی کە بگاتە ئاستی ئەڤین و خۆشەویستی، هەموو بەندەکانی خودا بە تایبەت دۆستانی پەروەردگاری هێژای دلۆڤانی خۆش دەوێ؛ تەنانەت بە چاوی پڕ بەزەیی و خۆشەویستیەوە سەیری ئافرێندراوانی خودای دەکا. هەموو بوونی خۆی و ئەوەی لە خۆیدایە بە ئاسەواری دەستەرەنگینەکانی پەروەرندەی دەزانێ؛ چونکە شەیدای پەروەردگارە، ئەویندارانی جێگە پەنجەی خێوی جیهانە و دانستەکانی لای هێژایەو خۆشەویستە.

دۆستی دەگەڵ پەروەردگار دەبێتە دوو پاژ: بەشێک لە بۆ خێر و ودمی دونیا و دوارۆژە و هەندێکی لە بۆ تەنیا خودایە؛ ئەگەر لەبۆ هیچ شت نەبێ، زۆر چاکترە. ڕاڤەی ئەم بەشە لەبنەمای «خۆشەویستی»دا دەبێژرێ.

بەگشتی هێز و خۆستی خۆشەویستی پەروەردگار، بەقەدەر هێز و وزەی ئیمانە؛ هەرچەند بڕوا قایمتر و بەهێزتر بێ، خۆشەویستی پتەوتر و مەزنترە؛ پاشان ئەو خۆشەویستییە دەگاتە دۆستان و بژاردەکانی پەروەردگار. ئەگەر خۆشەویستی تەنیا بۆ قازانج و خێر بوایە، نەدەبوا کەس هیچ مردوویەکی -وەکوو پێغەمبەران و چاکان و زانایان- خۆش بویستایە، کەچی بە ئاوەژووی ئەمەیە. کەواتە هەرکەس زانایان و پیاوچاکان و سۆفی و پارسا و پارێزکاران و دەستوپێوەندی ئەم کەسانەی خۆش بوێ، تەنیا لەبەر ڕەزای خودایە. بەڵام ڕوونکردنی ڕادەی دۆستایەتی بە بەختکردنی ماڵوسامان خویان دەبێ. کەسی واش بووە کە ڕادەی خۆشویستنی ئەوەندە بووە کە نووکوبەدی ماڵوسامانی دابەش کردووە، وەکوو ئەبووبەکری سدیق؛ کەسیش بووە نیوەی داوە، وەکوو عومەری خەتتاب؛ کەسیش هەیە کە پتر لە نەختێکی پێ نادرێ؛ لە ڕاستیدا دڵی هیچ بڕواداری لەم خۆشەویستیە بۆش نییە، هەرچەند زۆریش کەم بێ.

**ڕاڤەی دوژمنی بۆ پەروەردگار**- ئەوەی گوێڕایەڵانی پەروەردگاری خۆش بوێ، بێشک ڕقی لە کافری داوێنپیس و ستەمکاری نەگریس و دوژمنانی هیچنەزانی پەروەردگارە؛ چونکە هەرکەس کەسێکی خۆش بوێ، دۆستانی لە لا بەڕێزە و دوژمنانی لا دوژمنە. کەواتە، ئەگەر موسوڵمانێ داوێنپیس بێ، بە بۆنەی موسوڵمانیەکەیەوە دەبێ خۆشی بوێ و لەبەر داوێن پیسیەکەی ڕقی لێ بێ و دۆستی و دوژمنی پێکڕا کۆوەکا؛ وەکوو ئەوەی کەسێک خەڵاتێک بداتە فرزەندی کەسێک و ئازار بگەیەنێتە منداڵیتری، بە بۆنەی خەڵاتەکەوە خۆشی دەوێ و بە بۆنەی ئازارەکەوە لێی تووڕە دەبێ و ئەمەش بۆی هەیە پێکڕا کۆوەبن. هەروەها ئەگەر کەسێک سێ منداڵی بێ، یەکیان ژیر و گوێڕایەڵ، یەکیان

گێل و گوێنەدەر و ئەویتریان گێل و گوێڕایەڵ بێ. جا بەم پێیە یەکیانی خۆش دەوێ و لە یەکیان زیزەو سێهەمینیانی لە سۆنگەی گێلیەکەیەوە خۆش ناوێ، بەلام بە بۆنەی گوێڕایەڵ بوونیەوە خۆشی دەوێ. ئاسەواری ئەم بۆچوونە لە هەڵس‌وکەوتدا دیارە، رێز لە یەکێکیان دەنێ، سووکی بە یەکیان دەکاو سێهەمینیان لە مەودای نێوانی رێزو سووکیدا رادەگرێ.

بە کورتی ئەوەی بەئاوەژووی پەیڤی خودا ببزوێتەوە و گوناح کا، دەبێ لات وابێ کە دەگەڵ تۆ خراپەی کردووە، بۆیە بەرادەی دژایەتی ئەو دەگەڵ پەروەرندەت، بە دوژمنی بزانە و بە قەدەر گوێڕایەڵبوونی لە هەمبەر خوداوەند، خۆشت بوێ. دەبێ ئەم بۆچوونەت لە هەڵس‌وکەوت و پێوەندی دەگەڵ خەڵکیدا خویان بێ و لەگەڵ سەربزێو و گوناحکار گرژ و مۆن بی و قسەی توند و رەقیان پێ بلێی. لەگەڵ کەسێک کە ئاکاری نزمی زۆروزەوەند بێ، مژومۆڕترو تووشتر بی و ئەگەر گوناح و تاوانی لە رادەبەدەر بوو، رووی لێ وەرگێرە و دەگەڵی قسە مەکە؛ دەگەڵ ستەمکار، نژمشۆڕتر[1] بە تاکوو ئاکارنزم و داوێن‌پیس؛ مەگەر ئەو ستەمکارە، ستەمی لە خۆت کردبێ، ئەوسا لێبوردن و دلاوایی هێژاتر و بە دەوترە.

پێشوونان لەم بابەتەدا رای جۆراوجۆریان بووە:

تاقمێ لەتوندو تیژیدا زێدەڕۆییان کردووە، تا گەورەیی دین و سیاسەتی شەرع بپارێزرێ. ئەحمەدی حەنبەل لەم تاقمە بوو، چونکە کاتێ لە «حارث محاسبی» تووڕە بوو کە پەرتووکێکی لە پووچەڵکردنی را و شوبهەکانی موعتەزیلەدا نووسیبوو، پێی گوت: «لە کتێبەکەتدا زۆرتر باس لە را و شوبهەکانی ئەوان دەکەی، پاشان وەرامیان دەدەیتەوە. رەنگە کەسێک ئەم رایانە بخوێنێ و بە سەردڵیدا کاریگەر بێ و ئاوڕ لە رەخنەکانت نەداتەوە». یەحیای موعین گوتی: «من لەهیچ کەس، هیچم ناوێ، بەلام ئەگەر پادشا شتێکم بداتێ وەریدەگرم». لێی تووڕە بوو و ئەوەندەی پێگوت تا لە پەیڤی خۆی پاشگەز بوو و گوتی: «گاڵتە و گەپم کرد». گوتی: «خواردن لە دینەو دەگەڵ دین گاڵتە مەکەن»[2].

تاقمێ بە چاوی پڕ لە بەزەییەوە سەیری هەموو شتیان کردووە؛ هۆی ئەوەش بۆچوون و مەبەستیان بووە: ئەوەی بە چاوی تاکپەرستانەوە سەیزی هەموو دونیا دەکا و سەرلەبەری ئەم جیهانە پان و بەرینە لە ژێر رکێفی پەروەرندەیدا دەزانێ، بە چاوی بەزەیی و دلۆڤانی سەیری هەموو عالەم

---

١ - نژمشۆڕ = رووگرژ

٢ - رەنگە مەبەستی ئەوە بووبێ کە بژێوی ژینتان لە پەنای دینەوە دابین دەبێ.

دەکاو ئەمەش پلەوپاگەیەکی بەرز و هێژایە، بەڵام بۆی هەیە گێل و نەزانان پێی هەڵفریون، چونکە هەن کەسانێک کە لە دڵەوە زمان لووس و دووڕوو بن، کەچی پێیان وابێ تاکپەرستن. نیشانەی تاکپەرستی ئەوەیە کە گەر کەسێک سووکت بکاو تێت هەڵبدا و ماڵت بباو زمان درێژیت لەگەڵ بکا، بە چاوی پڕ لەبەزەیی سەیری بکەی، لە بۆ ڕەزای پەروەرندەت لێی ببووری و لەبەرسڤدا تا پێت دەکرێ دوعای بەخێری بۆ بکەی. هەروەکوو چۆن، خەڵکی نەزان، ددانی پێغەمبەریان شکان، کەچی پێغەمبەری خۆشەویستی لە وەرامدا گوتی: «اَللّٰهُمَّ اهْدِ قَوْمِي فَأَنَّهُمْ لا يعلمُون»[1]. بەڵام ئەوەی لە مافی خۆی لانەدا، کەچی لە مافی خودا ببەخشێ، ئەمە دوڕوویی و مەرایی و گێلی و گەوجییە، نەک تاک پەرستی. ئەو کەسەی خراپەکاری مرۆی ئاکار سووک، تووڕەی نەکا، هۆی کزی و لاوازی دڵ و دەروون و بڕوایە و لەدۆستیدا گزیکارە؛ هەر وەکوو چۆن ئەگەر کەسێک لە پاشملەی برادەرت پەیڤی درۆ و نابەجێ بڵێ و تۆ تووڕە نەبی، ئاشکرایە ئەو دۆستی و برادەرییە هیچ بنەما و بناغەیەکی نییە.

**سەرنج**- ئاست و ڕادەی بەرهەڵستانی پەروەردگار جۆراوجۆرە، بۆیە توندی و تیژی و تووڕەبوون دەگەڵیان دەبێ جیاواز بێ:

**ئاستی یەکەم** - کافرانن. جا گەئەر ئەو کافرە، دوژمنی شەڕانی و گیانی بوو، تەنیا پێوەندی لەگەڵیان کوشتن و بڕین و لێدانە.

**ئاستی دووهەم**، ئەهلی زەممەن (اهل ذمه)؛ دوژمنایەتی لەگەڵ ئەم کەسانە فەرزەو هەڵسوکەوت لە گەڵیان دەبێ بۆ سووککردن و ڕێزلێنەگرتن و ڕێگا پێتەنگ کردن لەڕۆییندا بێ. دۆستی دەگەڵیان گەلێک ناحەزەو دەگاتە ڕادەی حەرامبوون. چونکە پەروەردگار فەرمووی: لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ[2]. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی بڕوای بە خودا و ڕۆژی پەسلان بێ، دەگەڵ دوژمنانی خودا دۆستایەتی ناکا». بەڵام ئەسپاردنی حکوومەت، ناردنیان بە دووی کاری گرینگ، متمانە پێکردن و زاڵکردنیان بەسەر موسوڵماناندا، سووکایەتییە بەموسوڵمانان و لە گوناحانی گەورەیە.

**ئاستی سێهەم**: داهێنەرە، ئەوەی خەڵکی بۆ شتی نوێ و داهێنان لە دیندا بانگێشتن دەکا. دەبێ پەردەی لەسەر ڕوو لابدرێ تا خەڵکی لە مەبەست و نیازی ناحەزی ئاگادار بن. چاتر وایە بە

---

[1] - پەروەرندەم! هۆزەکەم ڕێنوێنی بکە، چونکە ئەمان نەزانن.

[2] - قورئان (٢٢/٥٨) تۆ نابینی ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە خوداو ڕۆژی سەلا، نابێ هەرگیز ببنە دۆستی ئەو کەسانەی پێچەوانەی خوداو پێغەمبەری خودان. (هـ).

موسوڵمانی نەزانن، دەگەڵی هیچ قسە نەکەن، سڵاویشی وەرام نەدەن، هەروەها ئەگەر خەڵکی بەرەو لای خۆی گاس دەکرد، ئەوە شەڕ و زیانی ئێجگار زۆرە، کەچی ئەگەر لاوەکی و نەخوێندەوار بوو و خەڵکی بەرەو لای خۆی بانگ نەدەکرد، ئەوە زیانی زۆر کەمترە و کێشە و گرفتی زۆر سووکترە.

لە **ئاستی چوارەمدا** گوناحێکە کە رەنجی خەڵکی تێدابێ؛ وەکوو ستەمکردن، شادەی بە درۆ، حوکم بە مەیل نەک بە شرع، شیعری روو هەڵماڵراو و قسە و پەیڤی پشتەمل و خەڵکی لە یەک دڕدۆنگ کردن؛ دووری لەم کەسانە و بە توند دەگەڵیان ئاخافتن هێژاتر و رەواترە. برادەری لە گەڵیان گەلێک ناحەز و نالەبارە و تەنانەت دەکرێ بڵێن حەرامە.

لە **رادەی پێنجەم** ئەو کەسانەن خواردنەوە دەخۆن، داوێن پیسی دەکەن، بەڵام ئازاریان بە کەس ناگا، کێشەی ئەم کەسانە ساناترە و ئەگەر هیوا بە راهاتنیان بوو، دەبێ بە نەرمی و بە گفتی جوان ئامۆژگاری بکرێن، ئەگینا چاتر وایە لێیان دوور بی، بەڵام وەرامی سڵامیان بدەنەوە و لەحنەتیان لێ مەکەن. چونکە لە سەردەمی پێغەمبەردا یەکێک چەن جار خواردنەوەی خوارد و حەدیان لێ دا. یەکێک لە یارانی پێغەمبەر لەحنەتی لێکرد و گوتی: «گوناحی ئەم تاوانەی چەندە؟» پێغەمبەر لۆمەی کرد و فەرمووی: «شەیتان بۆ دوژمنایەتیکردنی بەستە، تۆش بۆ ئازاری مەبە بە یاری شەیتان».

## بەشی دووەم – ئەرک و مەرجەکانی دۆستایەتی

هەرکەس شیاوی دۆستایەتی نییە و دەبێ لەگەڵ کەسێک ببیتە برادەر کە خێوی ئەم دانستانە بێ:

**دانستەی یەکەم**، ژیرییە؛ پێوەندی دەگەڵ مرۆڤی گەوج و تێنەگەیشتوو هیچ خێری نییەو ئەنجامی هەر سڵکردنە، چونکە مرۆڤی گەوج لەو دەمەیدا کە پێویستە چاکەت دەگەڵ کا، رەنگە لە سۆنگەی گێلییەوە، شتێ بڵێ و کارێ بکا زیانی تۆی تێدا بێ. گوتوویانە: «لە گەوج دووربوون نزیکییە بەخوداوەند و سەیرکردنی گوناحە». گەوج ئەوەیە لە راستەقینە هیچ شت نەزانێ و کە پێی بڵێن هیچ تێنەگا.

**دانستەی دووەم** ئاکاری بەرزو جوانە، چونکە قەد لەزیانی ئاکاری نزم بێوەی نابی، کاتێ بە رەوشتی سووک دەبزوێ، هیچ پەکی بۆ ماف و حەقی تۆ ناکەوێ.

**دانستەی سێهەم** ئەوەیە کە چاکەکار بێ؛ چونکە ئەوەی لەسەر گوناح پێداگری کا، لە پەروەرندەی شەرم ناکا؛ ئەوەش شەرمی خودا نەیگرێ و لێی نەترسێ، جێی بڕواو متمانە نییە. پەروەردگار دەڵێ:

وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ[1] ؛ واتە: گوێ لە مستی کەسێ مەبە کە نەمانهێشت دڵی یادی ئێمە بکا و هەر لە شوێن ئارەزووی خۆیە. ئەگەر داهێنەر (مبدع) بوو دەبێ لێی دووربێ، چونکە ئەو داهێنانە لە دڵت تەشەنە دەکا، یا خۆ رەنگە بکەویتە بەر قوشمەیی ئەو. هیچ داهێنانێ لەمەی ئێستا هاتۆتە دی، پتر نییە کە تاقمێ دەڵێن: «نابێ لە نێوان خەڵکدا دادوەری بکرێ و لە تووش‌بوون بە گوناح و کاری نالەبار بیانپارێزین؛ چونکە دەگەڵ خەلکوخوا دوژمنایەتیەکان نییە و دەستێوەردان لەژیانیان رەوانییە». ئەم پەیڤە یەیڤی ئەباحەتەو رازی لەدین دەرچووانەو داهێنانێکی ئێجگار گەورەیە: نابێ لەگەڵ ئەم تاقمەدا تێکەڵاو بێ؛ چونکە ئەم پەیڤە دڵخوازی ئارەزووە و شەیتان یاریدەی دەدا و لە دڵیدا دەیرازێنێتەوەو دوور نییە بە راشکاوی ئەباحەتی خۆی بنوێنێ.

جەعفەری سادق گوتوویە: «لەئاخافتن لەگەڵ پێنج کەس خۆ دوور بگرن: یەکەم درۆزن؛ چونکە بەردەوام دەتخاپێنێ؛ دووەم مرۆڤی گەوج، چونکە ئەو کات کە ویستی خێرت پێ بگەیێنێ، تووشی زیانت دەکاو خۆی نازانێ؛ سێهەم نەگریس، کە چاترین کاتت دەبا؛ چوارم ترسنۆک، کە لەکاتی پێویستدا بەتەنیات دێڵێ؛ پێنجم داوێن‌پیس کە بە پارووێک و بگرە کەمتریش دەتفرۆشێ». گوتیان: «ئەوە چییە؟»[2] گوتی: «ددان تیژکردن لەو پارووە».

جونەید گوتی: «ئاخافتن لەگەڵ داوێن‌پیسی رووخۆشم پێ‌خۆشترە تا قورعان خوێنی گرژ و مۆن».

ئەوەی بزانە سەرجەمی ئەم دانستانە بە دەگمەن کۆوە دەبن؛ بۆیە دەبێ مەبەست لە دۆستیت لا روون بێ: ئەگەر مەبەستت هۆگرییە، بە دووی رووگەشدا بگەڕێ؛ ئەگەر مەبەستت دونیایە، دڵاوایی و دەهندەیی ببینەوە؛ ئەگەر مەبەستت دینە، بەدووی زاناو پارێزکاردا بگەڕێ؛ بۆ هەر یەک مەرجێک هەیە.

خەڵکی سێ جۆرن: هەندێ وەکوو خواردنن، ناتوانی لێیان بێ‌نیار بی؛ هەندێ وەکوو دەرمانن، لە هەندێ کات و ساتدا پێویستت پێیان دەبێ و بەس؛ هەندێ وەکوو نەخۆشین، قەد پێویستت پێیان نابێ، بەڵام هەندێ کەس پێی تووشیار دەبن: دەبێ لەگەڵیان بساچی تا لێی دەرباز بی. بە کورتی دەبێ لەگەڵ کەسێک پێوەندیت بێ هەم قازانج بە دینت بگەیێنێ و هەم تۆش قازانج بەدینی ئەو بگەیێنی.

---

[1] - قورئان، ١٨/٢٨.

[2] - مەبەست کەمتر لە پارووێک.

## راڤەی ئەرکەکانی برادەری و دۆستایەتی

پەیمانی برادەری و دۆستایەتی وەکوو پێوەندی ژن و مێردی ماف و ئەرکی تایبەتی هەیە. پێغەمبەر فەرمووی: «دوو برادەر وەکوو دوو دەستن کە یەکتر دەشۆن». ئەم ئەرکانەش دەن:

**ئەرکی یەکەم**، ماڵە. بەرزترین ئاستی ئەوەیە کە لە خۆ ببوێرێ و هەرچی هەیە پێی بدا، هەروەک لە پەسنی ئەنسارییەکاندا گوتراوە: وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ[1]. ئاستی دووهەم ئەوەیە کە خۆیان و هەڤاڵیان لەیەک جیا نەزانن، ماڵیان نیوەبەنیوە دابەش کەن. دوایین ئاستیش ئەوەیە ئەوەی بۆ کۆیلەی پێویست بێ لە برادەری خۆی دریخی نەکا؛ واتە بە بێ ئەوەی دۆستی هیچی گوتبێ، ئەوەی لە دەستی بێ، بۆی جێبەجێ کا. ئەگەر داوای لێکرد و پاشان پێی دا، ئیدی ئەوە بە دۆستی نایەتە هەژمار؛ چونکە بیری ئەو یارمەتییە لە دڵی خۆی هەڵنەقولاوە و ئەم برادەرییە شتێکی ئاسایی و کەم بایەخە.

«عتبة الغلام» برادەرێکی بوو، پێی گوت پێویستم بە چوار هەزار درهەمە. گوتی: «ئەوە دووهەزار درهەم». لێی تووڕە بوو و گوتی: «شەرم ناکەی خۆت بە دۆستی خودایی دەزانی و لە ماڵی دونیات نابەخشی؟»

لەلای یەکێک لە خەلیفەکان خراپەی تاقمێ سۆفییان گوت. خەلیفە بۆ کوشتنیان رابوو. سۆفییەکان ئەبولحەسەنی نووریان لە نێواندا بوو. ئەبولحەسەن خۆی خستە پێش و گوتی سەرەتا من بکوژن. خەڵیفە زۆری پێ سەیر بوو؛ گوتی: «مەبەستت چییە؟» گوتی: «ئەمانە برادەرو هەڤاڵی دینیمن، با سەرەتا من بکوژرێم و گیانم بەختی ئەوان بێ، تا ماوەیەک پتر لەمن بژین». خەلیفە راما، پاشان گوتی: «ئەوەی وابێ پێم ناکوژرێ». وازی لە هەموویان هێنا و دەستی لە کوشتنیان هەڵگرت.

فەتحی مووسڵی رۆیشت بۆ ماڵی برادەرێکی؛ لە ماڵ نەبوو. بانگی لە کارەکەرەکەی کرد کە سندۆقەکەی بێنێ؛ ئەوەی ویستی هەڵیگرت و رۆیی. کە برادەرەکەی گەڕایەوە و ئەمەی بیست، لە خۆشیان کچەکەی ئازاد کرد.

یەکێک هاتە لای بووهورەیرە و پێی گوت: پێم خۆشە دەگەڵت برادەری کەم. گوتی: «نابێ زێڕ و زیوت پتر لە من بێ». گوتی: «هەنووکە نەگەیشتوومە ئەم ئاستە». بووهورەیرە گوتی: «کەواتە بڕۆ برادەری لە تۆ ناوەشێتەوە».

ئیبنی عومەر گوتی: «یەکێک لە یارانی پێغەمبەر سەروپێیەکی نارد بۆ دۆستێکی. ئەو دۆستەی

---

[1] - قورعان (٩/٥٩) فەرزی میوان دەدەنە سەر خۆیاندا، هەرچەند خۆشیان زۆر دەست کورتن. (هـ)

گوتی: «فلان برادەرم فرەتر لە من پێویستی پێیە، بۆی دەنێرم»؛ ناردی بۆی. ئەو کەسەش هەروا بۆ برادەرێکیتری نارد؛ دەست بەدەست گەڕا، لە ئەنجامدا گەڕایەوە لای یەکەم کەس».

«مسروق» و «خیثمە» دۆستی یەک بوون؛ هەردوو قەرزدار بوون. ئەمیان قەرزی ئەوی دایەوە و ئەویان قەرزی ئەم، هیچ یەکیشیان بەویتری نەزانی.

ئەمیرەلمۆئمنین عەلی گوتی: «بیست درهەم بدەمە برادەرم، لام چاتر لەوەیە سەد درهەم بە خێر بدەمە هەژاران». پێغەمبەر ڕۆیشتە نێو بێشەیەک، دوو مسواکی بڕی، یەکیان لار و یەکیان ڕاست. یەکێک لە یارانی لە گەڵدا بوو، ڕاستەکەی دابە ئەو و لارەکەی بۆ خۆی هەڵگرت. گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەیان چاترە، بۆ ئێوە زۆر باشترە». گوتی: «نە، هەرکەس ماوەیەک لەگەڵ کەسێک برادەر بوو، لێی پرسیار دەکەن کە ئەرکی برادەری بە جێ هێناوە یا نە». ئاماژەی کرد کە ئەرکی برادەری، لە خۆ بوردنە و فەرمووی: «دوو کەس کە پێکڕا برادەر بن، هێژاترینیان لە لای پەروەردگار ئەوەیە کە دۆستەکەی زۆرتر خۆش بوێ».

**ئەرکی دووەم**، یارمەتیدانە لە هەموو گرفتێکدا بەر لەوەی لێی داوا بکرێ؛ هەروەها بە دڵی خۆش و ڕووی گەش بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ڕابێ. پێشوونان هەموو ڕۆژێ دەڕۆیشتنە بەر دەرکی هەڤالیان و لە خێزانی دۆستەکەیان دەپرسی: «کارتان نییە؟ نان و هێزمتان هەیە؟ خوێ و ڕۆن لەماڵ هەیە؟» کاری ئەوانیان وەکوو هی خۆیان بە گرینگ دەزانی و بە پێکهێنانی گەلێک شادوشوکر دەبوون.

حەسەنی بەسری دەڵێ: «دۆستان و برادەرانمان لەخاو و خێزانمان هێژاترن؛ چونکە ئەمان دینمان دەخەنەوە بیر، کەچی ژن و منداڵ دەمانپەرژێننە سەر دونیا». عەتا دەڵێ: «پاش سێ ڕۆژان لە دۆستانتان بپرسنەوە؛ ئەگەر نەخۆش بوون، سەردانیان کەن؛ ئەگەر بەکارێکەوە خجڵ بوون، یارمەتیان بدەن؛ ئەگەر لە بیریان نەمابوو، بیخەنە بیریان».

جەعفەر کوڕی محەممەد گوتی: «من هەوڵ دەدەم تا گرفتی دوژمن چارەسەر کەم و لە من بێ نیاز بێ، ئاخۆ بۆ دۆستم چ بکەم؟»

لە پێشوونان کەسی وابووە کە پاش مردنی برادەری، چل ساڵ چاودێری ژن و منداڵی کردووە و پێیان ڕاگەیشتووە، تەنیا لەبەر خاتری دۆستایەتی.

**ئەرکی سێهەم** لەسەر زمانە. دەبێ زمانی لە مەڕ برادەران بە چاکە بگەڕێ و کەمایەسییەکانیان بشارێتەوە. ئەگەر کەسێک خوسپەی دۆستی کرد، بەرپەرچی پەیڤی بداتەوە و وابزانێ برادەری لە پەنا دیوارێ خۆی حەشارداوە و دەیبیسێ؛ بەو چەشنەی کە پێی خۆشە دۆستی دەگەڵ ئەو وابێ، ئەمیش بۆ دۆستی وابێ. دەگەڵی مەرایی نەکا؛ کە ئاخاوت، گوێی پێ بدا، دەگەڵی شەڕەقسە نەکا،

نهێنییەکانی ئاشکرا نەکا، هەرچەند لە یەک دابڕابن؛ چونکە گەلێک لە مێرخاسی بەدوورە.

بە خراپە باسی ژن و منداڵ وماڵی نەکا؛ ئەگەر کەسێک پلاری تێگرت، دەگەڵی هاوڕایی نەکا. ئەگەر چاکەیان گوت خۆی بێدەنگ نەکا. ئەگەر کورتیەکی لە گەڵ کرد، گلەی لێ نەکا و بیر لەو هەموو کورتیەی کا کە خۆی دەگەڵ خودا بوویە و هیوای هەیە خودای مەزن لێی ببوورێ. ئەگەر بە تەمابێ کەسێ ببینێتەوە کە بێ کەمایەسی بێ و هیچ عەیبی نەبێ و کورتی لە کاریدا نەبێ، دەبێ بزانێ رەنج بە خەسارە و هیچ کەسی وای دەست ناکەوێ و دەبێ هەر بە تاقی تەنێ بژی.

لە خەبەردا هاتووە کە: «بڕوادار بیانوو دێنێ و دوڕوو خراپە دەڵێ». دەبێ بە چاکەیەک دە گوناح بپۆشێ، چونکە پەروەرندەی دەڵێ: «لە دۆستی خراپ پەنا بەرنە بەر پەروەردگار؛ چونکە کاتێ کەمایەسیەکی دی، ئاشکرای دەکا و کە چاکەی دی دایدەشارێ». دەبێ بۆ هەر کورتیەک کە بیانووی بۆ هێناوە، دانی پێدا بنێ و گومانی خراپی لێ نەبا؛ چونکە بەدگومانی حەرامە.

پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەردگار چوارشتی مرۆڤی بڕواداری لە هەمووان حەرام کردووە: ماڵ، خوێن، ناموس و ئەوەی کە لێی دڕدۆنگ بن».

عیسا دەڵێ: «چ بڵێم بەو کەسەی کە برادەری نووستبێ و ئەم جلکی لەبەر داکەنێ، تا شەرمگای وەدەرکەوێ؟ » گوتیان: «ئەی پێغەمبەری خودا! کێ دەوێرێ ئاوا بکات؟» گوتی: «ئەنگۆ؛ کاتێ عەیبی برادەرتان دەزانن و لەلای خەڵکی باسی دەکەن تا ئاشکرا بێ».

گوتوویانە: «کە ویستت دەگەڵ کەسێک ببیتە دۆست، تووڕەی بکە و پاشان بە نهێنی کەسێک لەلای خۆتەوە بنێرە لای تا باسی تۆ بکا. ئەگەر هیچ لە رازی تۆی ئاشکرا کرد، ئەوە کەڵکی دۆستی پێوە نییە». دیسان گوتوویانە: «کەسێک بە دۆست بگرە، کە هەرچی پەروەردگار لێت دەیزانێ، ئەویش بیزانێ و چۆن پەروەردگار دایدەشارێ، ئەویش دایپۆشێ». یەکێک نهێنیەکی بە برادەرێکی گوت، پرسی: «لە بیرتە؟» گوتی: «نە؛ لەبیرم نەماوە».

گوتوویانە: «ئەوەی لە چوار کاتدا رووی لێت وەرگەڕاند شیاوی دۆستایەتی نییە: کاتی بەختەوەری، تووڕەیی، تەما و ئارەزوو؛ بەڵکوو دەبێ لەم کاتانەدا ئەرکی لە هەمبەر تۆ لە بیر نەکا».

عەبباس بە عەبدوڵڵای کوڕی گوت: «ڕۆڵە! عومەر گەلێک خۆشتی دەوێ و لە پیرانی وەسەرناوی. ئاگادار بە پێنج شت راگری: هیچ نهێنییەکی ئاشکرا نەکەی، لای ئەو خوسپەی کەس نەکەی، قەد لە گەڵی درۆ نەکەی، قەد بەئاوەژووی قسەی نەکەی، دۆگمانە و ناپاکی لەگەڵ نەکەی».

هیچ شت وەکوو شەڕەقسە لە باسێکدا بینای دۆستی ناڕووخێنێ. گەر قسەی دۆستت پووچەڵ کەیتەوە، وات پیشان داوە کە ئەو گێل و هیچ نەزانە، کەچی تۆ زاناو تێگەیشتووی، بە سووکی

سەیرت کردووە و دەماربەرزیت پیشان داوە؛ ئەمەش کارێکە کە مرۆڤ زۆتر لە گەڵ دوژمنی دەیکا تا دۆستی.

پێغەمبەر فەرمووی: «دەگەڵ قسەی هەڤاڵت چەنە بە چەنە مەکە، گاڵتەو قەشمەری پێ مەکە، قەد بە ئاوەژووی بەڵێنت مەکە».

گەورەکان گوتوویانە: «کە بە دۆستت گوت هەستە و ئەو گوتی بۆ کوێ، ئەوە شیاوی دۆستایەتی نییە؛ بەڵکوو دەبێ هەستێ و هیچ نەپرسێ». ئەبووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «دۆستێکم بوو، هەرچیم دەویست، نەیدەگوت نە و پێمی دەدا. جارێک گوتم بە شتێکت نیازم هەیە. گوتی تا کەی. لەو دەمەوڕا شیرینی ئەو دۆستایەتیەم لە دڵ ڕەویوەتەوە».

بەکورتی، بەردەوامی دۆستایەتی لە هاوڕایی لەو شتانەیە کە شیاون بۆ هاوڕایی.

**ئەرکی چوارەم** دەربڕینی خۆش ویستن و دلۆڤانیە. پێغەمبەر فەرمووی: «اذا اَحَبَّ اَحَدُکُم اَخاهُ فَلْیُخبِرهُ»؛ واتە: ئەوەی کەسێکی خۆش دەوێ، دەبێ لەو خۆش‌ویستنەئاگەداری کاتەوە. هۆکەشی ئەوەیە کە تووی خۆشەویسی لە دلی ئەویشدا بچێنێ و خۆش گەرەک بوون لە هەر دووسەر بێ.

کەواتە، دەبێ لە هەموو بارودۆخێکی بپرسێ و بە دەم بلێ هاوڕێی خەم وشادییەو شادی و پەژارەی لە خەم و کەسەر و خۆشی خۆی بە جیا نازانێ. ئەگەر بانگی کرد، بە خاسترین ناو بانگی کا؛ ئەگەر نازناوێکی هەبوو، ئەوەی بلێ کە ئەو پێی خۆشە.

عومەر گوتی: «کەمایەسی برادەریت بە سێ شت تەواو دەبێ: یەکەم ئەوەی بەجوانترین ناو بانگی کەی، لە سلاو کردندا پێشڕەو بی و لە دانشتندا پاشڕەو». هەروەها دەبێ لە نەبوونیدا پەسنی کەی، کە سەر جێگایەک کە ئەو پێی خۆشە، دانیشی؛ بە چاکە باسی ژن و منداڵ و حاڵ و ئەحواڵ و ئەوەی بەوەو بەندیوارە بکەی، زمان بۆ چاکەی بگێڕی. ئەمە لە پتەوکردنی هەودای دۆستایەتیدا زۆرکاریگەرە. پەسنی چاکەکانی بکەو زمان بۆ سپاسی بگێڕە. عەلی دەڵێ: «ئەوەی بە مەبەستی چاکەی برادەری نەزانێ و سپاسی نەکا، بە کردەی چاکیشی نازانێ». کە خوسپەیان کرد بەرەنگاریان بێ و کە کەوتە بەر تەوس و توانج یاریکاری بێ و بە خۆی بیزانێ و گەر لە شوێنێکدا بە خراپە باسی دۆستەکەیان کرد و ئەم بێدەنگ بوو، ستەمێکی زۆر گەورەی کردووە. ئەمە گەلێک لەوە دزیوترە کە ببینێ برادەری کەوتۆتە بەر تووکەشەقی دوژمنانی، کەچی ئەم خۆی لێ لابدا و چاوی بەسەردا نووقاندووە.

یەکێک گوتی: «هەموو جارێ کە سەبارەت بە دۆستم ئاخاوتم، پێم وابوو بۆ خۆی لە لامە، بۆیە ئەوەم گوت کە پێم خوش بوو گوێی لێ بێ».

«ئەبوو دەردا» دوو گای بینی لە چۆڵێکدا دابەسرابوون. کە یەکیان رادەبوو، ئەویتریش هەڵدەستا.

گریاو گوتی: «ئەوانەی بۆ خوا برادەری دەکەن، دەبێ وابن، لە رابوون و رۆیشتندا هاودەنگ بن».

**ئەرکی پێنجەم** ئەوەیە کە هەرچی لەزانستی دین پێویست بوو بە برادەری فێر بکا، چونکە خەلسین لە ئاوری دوژەهـ هێژاتر لە چارکردنی کێشەی دونیایە. ئەگەر بۆ خۆی چاکی لێ دەزانی، کەچی گوێی پێ نەدەدا، بە مووچیاری ژیرانە لە دوارۆژی بترسێنێ؛ بەلام دەبێ ئامۆژگاری لە جێگەی چۆل و بێئەغیاردا بێ، تا میهرەبانییەکەی ئاشکرا بێ؛ چونکە ئەگەر لە لای خەڵکی مۆچیاری بکا، دەبێتە هۆی ناوزڕیان و ئاورووچوونی دۆستەکەی. پەندو موچیاری دەبێ بە نەرم و نیانی بێ، نەک بە زۆر و تێخوڕین. پێغەمبەر فەرمووی: «بڕوادار ئاوێنەی بڕوادارە»؛ واتە کەم و کووڕی خۆی تێیدا دەبینێ و دەیزانێ. کە برادەرت بە نەرم و نیانی، لە نهێنی و بەتەنیایی لە هەڵە و نوقسانت ئاگاداری کردی، لێی زویر مەبەو منەتباری بە؛ چونکە ئەمە وەکوو ئەوەیە یەکێک پێت بڵێ لە نێو جلک و پۆشەنتدا مارێ، دووپشکی خۆی حەشارداوە؛ ئاگات لە خۆ بێ». قەد لێی تووڕە نابی و بە دڵ سپاسی دەکەی. هەموو دانستە ناحەزەکانت وەکوو مار و دووپشکن، کەچی لە گۆڕدا گیانت دەگەزن؛ ئەوەش ئێجگار بە ئێشترە لە زام و برینی چزووی مار و دووپشکی ئەم دونیایە بەسەر جەستەو لەشتدا.

عومەر گوتی: «رەحمەتی خودا لەو کەسەی کەمایەسیەکانم بە دیاری پێم دەلێ». کە سەلمانی هاتە لای، گوتی: «ئەی سەلمان! راستم پێ بلێ لە پەیڤ و کردەم چت بیست و دی کەلات دزێو بوو؟» گوتی: «تکایە ئەم باسەم لە کۆڵ کەوە». گوتی: «هەر دەبێ بلێی». کە زۆری لەسەر سوور بوو، گوتی: «بیستوومە کە لەسەر خوانت دوو پێخۆر دادەنرێ و دوو کراست هەیە، یەکیان بەشەو دەبەردەکەی، یەکیان بە رۆژ». گوتی: «هیچیان راست نییە، ئیدی هیچت نەبیستووە؟» گوتی: «نە».

«حوزەیفەی مەرعەشی» نامەیەکی بۆ «یووسفی ئەسبات» نووسی و گوتی: «بیستم کە دینی خۆت بە دوو پوولی رەش، لە بازاڕدا فرۆتووە. لایەنی مامەڵەکەت گوتوویە دانگێک و تۆ گوتووتە چواریەکی دانگێ. ئەویش ئەو کالایەی پێت داوە، چونکە چاوی لەدین و زانستت بووە و رێزی ئەوانەی راگرتووە. کۆتی نەزانینت لە کۆل کەوەو لەخەو رابە. بە ڕای من هەرکەس زانستی قورعان فێر بێ و مەیلی دونیای لە دڵ بێ، پەیڤی پەروەردگاری کردۆتە گەپچاڕ».

بێز لە دونیا، نیشانەی خۆشەویستی دینە. خودا دەفەرمێ: وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ[1] بۆ ناساندنی درۆزنان، چونکە ئەوەی ئامۆژیارانی خۆش نەوێ خۆبەزلزانی و دەمارگرژی بەسەر دینیدا زاڵ بووە.

---

١ - قورعان (٧٩/٧) بەلان ئەنگۆ وا مۆجیارانتان خوش ناوێ.

ئەمانە هەموو لەو کاتەیە کە ئەو کەسە عەیبی خۆی نەزانێ. ئەگەر زانی، دەبێ بە پلارتێگرتن و بە نهێنی -نەک راشکاوی- مۆچیاری بکرێ. بەلام لە ئاستی تۆدا هەلەی کردبێ، چاتر وایە هیچ نەلێی و لێی ببووری، بەو مەرجەی دلت نەگۆڕی ودۆستیت دەگەلی وەک خۆی بمێنێ؛ ئەگەر زانیت دلی دەگۆڕێ خاستر وایە لەتەنیاییدا لۆمەی کەی تا ئەوەی کە لێی دابڕی. [گەر بە گلە و بناشت هێور نابیتەوە] ئەوسا لێک دابڕان باشتر لە زمان درێژی و جنێو دانە.

دەبێ مەبەستت لەپێوەندی دەگەل خەلک پاراوکردن و راهێنانی خوو و خدە و ئاکارت بێ بۆ هەلگرتنی ئازاری برادەرانت؛ نەک ئەوەی تەنیا چاوەڕوانی چاکەیان لێ بکەی. ئەبوبەکری کەتانی دەلێ: «پیاوێ دەگەلم بوو بە دۆست، زۆرم پێ گران بوو؛ دیاریەکم پێ دا تا ئەو گرانیەم لە دل بڕەوێ؛ کەچی نەڕەوی. دەستم گرت و بردمەوە بۆ مال و پێم گوت: پێ بەسەر سەرمدا بنێ. گوتی قەد نابێ. گوتم دەبێ پێ بنی بەسەر سەرمدا. ناچار وای کرد. ئەو گرانیەم لە دل ڕەوی».

«بووعەلی ڕەباتی» دەلێ: لەگەل ئەبووعەبدوللای رازی لە سەفەردا پێکڕا بووین. گوتی من سەرۆک بم یا تۆ؟ گوتم تۆ. گوتی هەرچی بلێم لێی لانادەی؟ گوتم دەبیسم و بە جێی دێنم. گوتی: ئەو توورەکە بێنە. بۆم هێنا. توێشوو و جلوبەرگ و هەرچی هەبوو، تێی ئاخنی و لەکۆلی نا. هەرچەند پێم گوت دەپێم بدە با کەم شەکەت بی، گوتی: «نە؛ پێم گوتی سەرۆک منم و تۆش دەبێ گوێڕایەل بی». شەوی دووەم باران دایکرد، تا بەیانی لەسەر پێدا راوەستا و رایەخێکی لەسەر سەرم ڕاگرتبوو تا تەڕ نەبم. کە پێم دەگوت بۆ وادەکەی، دەیگوت: سەرۆک منم، دەبێ لە فرمانی من لانەدەی. تا بەخۆم گوت: بریا نەمدەکردە سەرۆکی خۆم.

**ئەرکی شەشم**، بووردن لە هەلەو کورتییە. گەورەکان گوتوویانە: «ئەگەر دۆستێک هەلەیەکی دەگەل کردی، حەفتا هۆ بۆکردەی بێنەوە و لێی ببوورە، ئەگەر ئوقرەت نەگرت بە خۆ بلێ: "بەڕاستی کە گەلێک ئاکار نزم و بێ‌فەڕی؛ برادەرت حەفتا هۆی هێنایەوە و دانت بە هیچیدا نەنا". بەلام گەر تاوانی برادەرت لە ئاست تۆدا ئەوە بوو کە گوناحێکی تووش بوو، بە نەرم و نیانی و دوور لە چاوی بیانی، ئامۆژگاری کەو رایبێنە؛ ئەگەر گوێی نەدا و بۆ خۆشی نەیزانی، چاوی خۆتی لێ بنووقێنە؛ ئەگەر زانی و درێژەی پێدا، مۆچیاری کە. بەلام ئەگەر پێت وابوو لە گوێی گادا نوستووەو ئامۆژگاری هیچ کەلکی نییە، لەمەدا رای یارانی پێغەمبەر جیاوازە. ئەبووزەر دەلێ دەبێ لێی جیا بیتەوەو توخنی نەکەوی؛ بەلگەشی بۆ ئەم گفتەی ئەوەیە کە دەلێ: «ئەم کەسەم بۆ خاتری پەروەرندەم بە دۆست دەزانی و هەنووکەش هەر بۆ ڕەزای خودا بەدوستی خۆمی نازانم». ئەبوودەردا و کۆمەلێک لە یارانی پێغەمبەر رایان وایە کە: «نابێ بە تەواوی لێی دابڕێن، چونکە ڕەنگە لە کردەی خۆی پاشگەز و پەژیوان بێتەوە؛ لە سەرەتادا نابێ دەگەل ئەم کەسە پەیمانی دۆستی ببەسترێ، کە

بەسترا نابێ بە خێرایی بپچڕێ». ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێ: «ئەگەر برادەرت گوناحێکی تووش بوو، زوو لێی دامەبڕە؛ چونکە رەنگە شەوەکی لە کردەی خۆی پەژیوان بێتەوە». لە خەبەردا هاتووە کە پێغەمبەر فەرمووی: «لە هەڵەی زانا چاو بپۆشن و چاوەڕوانی پاشگەزبوونی کەن».

دوو هەڤاڵ بوون، لە کاری دیندا ئێجگار لەبار بوون. یەکێکیان دڵی تووش بوو بەداوی بسکی چاو خوماریێ. بە دۆستەکەی گوت: «دڵم نەخۆشی چاوێکی بیمار بووە، گەر پێت خۆشە لێم جیا بەرەوە». گوتی: «پەنا دەبەمە بە پەروەرندەم لەوەی کە لە بۆنەی گوناحێکەوە تەرکت کەم». بڕیاری بە خۆی دا تا پەروەرگار ئەو نەخۆشیەی لە کۆڵ نەکاتەوە نە بخوا و نە بخواتەوە. چل رۆژ رابورد و هەر خەریکی گازە و سکاڵا بوو. لێی پرسی: «چ رووی نەداوە؟» گوتی: «نە». لەسەر بڕیاری خۆی راوەستا و لە برسانا بێجگە لە پێست و ئێسک چیدی پێ نەما و کەچی هەر بۆ رزگاری ئەو دۆستەی لە بەر پەروەردگار دەپاڕایەوە. پاشان برادەری هات و گوتی: «پەروەرندەم لەو دەردەی دەرباز کردم و ئەوینی ئەو شۆخەی لە دڵ بردم؛ کەواتە بخۆ و بخۆرەوە».

بە یەکێکیان گوت: «برادەرت تووشی گوناحێکی مەزن بووە، بۆ لێی دانابڕی؟» گوتی «ئەو ئێستا پێویستی بە برادەر و دۆست هەیە، کوو دەبێ تەرکی کەم؟ هیچ تەرکی ناکەم، دەستی دەگرم و بە دلۆڤانی و خۆشەویستی لە ئاوری دۆژەهـ دەیپەڕێنمەوە».

لە نێو هۆزی بەنیئیسرائیلدا دوو دۆست پێکرا عیبادەتیان دەکرد. یەکیان بۆ کڕینی بژیو رووی لە بازێر نا. لە پڕ چاوی بە ئافرەتێکی رووسپی کەوت، لە خشتە چوو و دڵی پێ سپارد. لەلای مایەوە و پێی حەسایەوە. چەن رۆژ رابورد؛ برادەری دووهەم رووی لە شار نا و پرسان پرسان دۆستەکەی بینییەوە و لە بارودۆخی گەیشت. دۆستەکەی لەشەرمانا گوتی ناتناسم. گوتی: «ئەی برای برام! هیچ خەمت نەبێ؛ قەد وەکوو ئێستا خۆشم نەویستووی». دەستیان لە گەردنی یەک ئالاو جەمینی یەکیان ماچ کرد. دۆستی گیرۆدەی کە ئەم هەموو بەزەیی ودلۆڤانیەی بینی و زانی لە چاو و دڵی هەڤاڵەکەی نەکەوتووە، لە کردەی خۆی پاشگەز بوو و تۆبەی کردو گەڕایەوە.

بەڵام را و بۆچوونی ئەبووزەر هێمنترەو لە ناکۆکی بە دوورترە؛ کەچی ئەمیان هێورترو ژیرانەترە و بۆی هەیە ببێتە هوی پاشگەزبوونەوە. رۆژی دامان، کە نیاز بە هاودڵی برادەران زۆرترە، چۆن دەبێ لێکدابڕن؟ لە روانگەی فیقهەوە، پەیمانی دۆستی پاش بەستران، وەکوو پێوەندی خزمایەتییە، بە هۆی گوناح و تاوانەوە، لێکدابڕان، رەوا نییە. بۆیە پەروەردگار فەرمووی: فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ[1] واتە: ئەگەر هۆز و خزم وکەس و کارت بە گوێیان نەکردی، بڵێ: «زۆر بێزارم لە

---

١ - قورعان؛ ٢١٦/٢٦.

کردەتان» و نەیگوت «بلێ بێزارم لە خۆتان».

بە «ئەبوودەردا»یان گوت: «برادەرت تووشی گوناح بوو، بۆ بە دوژمنی خۆتی نازانی؟» گوتی: «ڕاستە؛ بەلام من کردەکەی بە دوژمن دەزانم؛ کەچی بۆ خۆی هەردۆستمە».

دەبێ سەرەتا لەگەل ئاوەها کەسێک پەیمانی دۆستی نەبەسترێ؛ چونکە لە نەبەستنی پەیمانی دۆستیدا هیچ سووچ و تاوانێ نییە، کەچی پچڕاندنی سووچ و گوناحی زۆر گەورەیە.

گەر لە حەناتدا هەلەیەکی کرد، لێبوردنی چاترە؛ کە داوای لێبوردنی لێت کرد -هەرچەن زانیت درۆ دەکا- بەلام بیپەزێرە. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس برادەری داوای لێبوردنی لێ کاو ئەم لێی‌نەبووری، گوناحی وەکوو گوناحی ئەو کەسەیە کە سەرەڕێ بە موسولمانان دەگرێ و پیتاکیان لێ دەستێنێ». پێغەمبەر فەرمووی: «بڕوادار هەم خێرا تووڕە دەبێ و هەمیش خێرا هێورەوە دەبێتەوە». ئەبووسلەیمانی دارانی بە شاگردێکی خۆی گوت: «کە لە دۆستێکت تووڕە بووی، پلاری تێ مەگرە؛ چونکە ڕەنگە پاش ئەو پلارە یەپڤێکت بەرگوێ کەوێ لەو دل ئێشانە گەورەترو خراپتر». شاگردەکەی گوتی: «کە پەیڤی مامۆستام تاقی کردەوە هەروام دی».

**ئەرکی حەوتم** ئەوەیە کە بەدوعای خێر برادەرت بکەیتە سەر؛ چ زیندوو بێ چ مردبێ. هەروەها بۆ ژن و مندالیشی هەروا. هەر بەو چەشنەی دوعاو گازە بۆ خۆی دەکەی، دوعای بەخێری دۆستت کە؛ چونکە لەراستیدا دوعات بۆ خۆت کردووە. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی لە تەنیایی خۆیدا دوعا و نزای بەخێر بۆ برادەری کا، فریشتەکان پێی دەلێن: "بۆ خۆشت". هەروەها پەروەردگار دەلێ: "سەرەتا بۆ خۆت"». دیسان فەرمووی: «دوعای بەخێر بۆ دۆستانتان لە تەنیاییدا لە بیر مەکەن».

«ئەبوودەردا» گوتی: «لە کڕنۆشدا حەفتا دۆستم هاتەوە بیر، بۆ هەموویان دوعای بەخێرم کرد». گوتوویانە دۆست ئەوەیە کە پاش مەرگت -کە هەموان پەرژاونەتە سەر دابەشکردنی مال و خوانت- خەریکی دوعای خێر بێ بۆت و لەو بیرەدا بێ کە ئاخۆ پەروەندەت چیت بەسەر دێنێ».

پێغەمبەر فەرمووی: «مردوو وەکوو ئەو کەسەیە لە نێو بەحرێکدا نوقم بووبێ و پەل بۆ هەر شوێنێ باوێژێ و بەردەوام چاوەڕوان بێ تا لەلایەن ژن و مندال ودۆستانیەوە دوعایەکی خێری بگاتێ. ئەو نزایانە وەکوو کێوێک لە رووناکی بەسەر قەبراندا دادەبارێن». لە خەبەردا هاتووە کە: «نزای بەخێر لەسەر تەوەقگەلێک لە رووناکی لەهەمبەر مردوواندا رادەنێن و دەلێن: "ئەمە دیاری فلان‌کەسە". ئەوانیش وەکوو چۆن زیندوو بە دیاری شاد دەبێ، بەو نزایانە شادوشوکر دەبن».

**ئەرکی هەشتم**- ئەمەگناسییە. واتای ئەمەش ئەوەیە کە پاش مەرگی برادەری ئاگای لە ژن‌ومندال و دۆست و برادەری نەبڕێ. پیرەژنێ گەیشتە پەرای پێغەمبەر. پێغەمبەر زۆری ڕێز لێنا. زۆر کەس لەم کارە سەریان سووڕما؛ گوتی: «ئەم پیرەژنە لەسەردەمی خەدیجەدا سەردانی دەکردین.

ئەمەگناسی نیشانەی ئیمانە». هەروەها ئەمەگناسی بریتییە لەوەی کە دەگەڵ کەس‌وکاری برادەری بە میهرەبانی و دلۆڤانی و رووگەشی ببزوێتەوە، تەنانەت پتر لەوەی دەگەڵ دۆستی هەیەتی.

هەروەها ئەگەر بە پلەوپاگەیەکی بەرز راگەیشت، دەگەڵ دۆستانی لووت‌بەرز نەبێ و خاکەسارانە لەگەڵیان هەڵس‌وکەوت کات.

هەروەها بەئەمەگ‌بوونی‌تر ئەوەیە کە پێوەندی دەگەڵ برادەری بەردەوام بێ و بە هیچ کلووجێک لێی دانەبڕێ؛ چونکە لای شەیتان هیچ‌کار لەوە گرینگتر نییە کە سۆدەری لە نێوان دۆستان کا؛ هەروەک پەروەردگار دەڵێ: إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ يَنزَغُ بَيۡنَهُمۡ[1]. هەروەها یووسف گوتی: مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ[2].

دیسان ئەمەگناسی بەوە دەڵێن کە بۆختان و هەڵبەستەی کەس لەئاست دۆستیدا نەژنەفێ و پاشدوو بەدرۆزن بزانێ. هەروەها دەگەڵ دوژمنی دۆستایەتی نەکاو بە دوژمنی خۆی بیزانێ؛ چونکە هەرکەس لەگەڵ کەسی‌تر دەبێتە برادەر، دەبێ دوژمنانی لەدڵ بکاتە دەرو بە دوژمنیان بزانێ؛ گەر وانەبوو، ئەو دۆستییە دۆستی نییە، پێوەندییەکی زۆر کزە.

**ئەرکی نۆهەم**، دەگەڵ دۆستیدا راحەت بێ و ئاسانگیر بێ و خۆ ماندوو نەکا؛ هەروەک تەنیا بێ: ئەگەر لە یەکتر شەرمێ دەکەن، ئەو دۆستیە ناتەواوە. عەلی دەیگوت: «خراپترینی دۆستایەتی ئەوەیە کە ناچار بی لە بیانوو هێنانەوەو لە پێوەندیدا خۆت ماندوو بکەی». جونەید گوتی: «هەڤالی زۆرم دیوە، قەد دوو هەڤالم نەبینیوە کە لێکتر شەرم کەن و کەمایەسییەک لە یەکیاندا نەبووبێ».

گوتوویانە: «هەڵس‌وکەوتت دەگەڵ هۆگرانی دونیا بەرێز و حورمەتەوە، لەگەڵ هۆگرانی پەسڵان بەزانست و وریاییەوە و لەگەڵ هۆگرانی تێگەیشن هەرجۆر پێت خۆشە بێ ».

تاقمێ لەسۆفییەکان بەو مەرجە بوونەتە برادەری یەک کە ئەگەر یەکێکیان بەردەوام یان بە رۆژوو بێ یان بخوا، یا خۆ سەرلەبەری شەوبخەوێ یا نەخەوێ، ئەویتر هیچ پێی نەڵێ بۆ وادەکەی.

بە کورتەی واتای دۆستی پەروەردگار، یەکیەتییەو لە یەکیەتیدا شەرم و خۆخستنە ئازار جێگای نییە.

**ئەرکی دوهەم**- ئەوەیە کەخۆ لە هەموو هەڤالانی کەمتر بگرێ، هیچ شتیان لێ چاوەنۆڕ نەکا، ئارەزووی هیچ بەزەییان لێ نەکاو هەموو ئەرکێکی چاک بە جێ بێنێ. یەکێک لەلای جونەید گوتی: «دۆست و هەڤاڵ لەم دەمەدا دەست ناکەون؛ زۆر دەگمەنن». چەند جار گوتی، تاکوو جونەید هاتە

---

١ - (قوعان، ١٧/٥٣ ) چونکە شەیتان سۆدرەیوو لەنێودا دەکا. (هـ).

٢ - (قورعان، ١٢/١٠٠) شەیتان لەنێوان من و براکانم بەدفەڕی کرد. (هـ).

قسەو پێی گوت: «ئەگەر کەسێکت دەوێ کە بارت بۆ هەڵبگرێ، ئازاری تۆ بکێشێ، دەرد و خەمت بچێژێ، کەسی وا زۆر دەگمەنە؛ بەڵام گەر کەسێکت دەوێ تۆ رەنجی ئەو بکێشی، خەم و مەینەتی بچێژی، ئەم کەسانە لە لای من زۆر و زەوەندن».

گەورەکان گوتوویانە: «هەرکەس پێی خۆش بێ لە دۆستانی سەرتر بێ، هەم خۆی تووشی گوناح دێ و هەم ئەوان؛ ئەگەر خۆی وەکوو یارانی بزانێ، هەم خۆی ئازار دەکێشی و هەم و ئەوان؛ کەچی گەر خۆی خوارتر لەوان بێنێتە هەژمار، هەم خۆی خاترجەم و ساغەو هەم ئەوان».

ئەبوومەعاوییەی‌ئەسوەد گوتی: «برادەرانی من پێکڕا لە من گەلێک هێژاترن، بە ئاکاریش زۆر بەرزترن، چونکە سەرتر و هێژاتر لە خۆیانم دەزانن».

## بەشی سێهەم – ئاخاوتن لەسەر ئەرکی موسوڵمانان، جیران وخزم و دەستوپێوەندان

ئەرکی هەرکەس لە بەرانبەر کەسی‌تردا بە گوێرەی نزیکی ئەو کەسەیەو نزیکیش ئاستی جۆراوجۆری هەیەو ئەرکەکان بە قەدەر ئەو ئاستەن؛ هەروەها بە هێزترین پێوەندی، برایی بە بۆنەی پەروەردگارەو ئەرکەکانی هاتنە گوتن. دەگەڵ ئەو کەسانەش کەدۆستی یەک نین، بەڵام پێوەندی دینیان هەیە، هەریەکە ئەرکێکیان لە ئەستۆیە کە بە وردی راڤە دەکرێ:

### ئەرکی موسوڵمانان

**ئەرکی یەکەم**– ئەوەی کە بۆ خۆی نەیویست، بۆ کەسانی‌تریش نەوێ. چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «خەڵکی وەکی یەک پەیکەرن: کە بەشێکی ئازاری چەشت، ئەندامانی‌تر تێی دەگەن و ژان دەچێژن». دیسان فەرمووی: «ئەوەی بیەوێ لەئاوری دۆژەەبپەڕێتەوە، دەبێ ژینی بە چەشنێ بێ کە مەرگ پێی‌ڕاگەیشت، پەیڤی شادەی لە سەرزار بێ، ئەوەی بۆ خۆی نایسەلمێنێ، بۆ هیچ موسوڵمانێ نەیەوێ».

مووسا گوتی: «پەروەرندەم! لەبەندەکانت کێهە دادوەرترە؟» فەرمووی: «ئەوەی دادی لێ بوەشێتەوە».

**ئەرکی دووەم**، نابێ هیچ موسوڵمانێ لە دەست و زمانی بە ئازار بن. پێغەمبەر فەرمووی: «دەزانن موسوڵمان کێهە؟» گوتیان: «خوداو پێغەمبەر چاتر دەزانن». فەرمووی: «ئەوەیە کە ئازاری دەست و زاری بە کەس نەگا». پرسیاریان کرد: «بڕوادار کێیە؟» گوتی: «ئەوەیە کە گیان و ماڵی خەڵکی لە دەستی ئاسوودە بن». پرسیان: «کەواتە کۆچەر کێیە؟» گوتی: «ئەوەی وازی لەخراپە هێنابێ». فەرمووی: «ناڕەوایە ئەو ئاماژەی کە ببێتە هۆی دڵ ئێشانی کەسێک، نابەجێیە ئەو کارەی ببێتە

هۆی ترس و دڵەڕاوکێی موسوڵمانان».

موجاهید دەڵێ: پەروەردگار لە ڕۆژی پەسلاندا ئالۆش و خورەو لە لەشی دۆزەهیاندا بەردەدا. ئەوەندە خۆیان دەخورێنن تا ئێسکیان خویان دەبێ. لێیان دەپرسن: «حاڵتان چۆنە؟» ئەوان دەڵێن: «زۆر پەشێوە». پێیان دەڵێن: «ئەمە تاوانی ئەوەیە لە دونیادا خەڵکی لەدەست و زمانتان ئاسوودە نەبوون».

پێغەمبەر فەرمووی: «لە بەهەشتدا یەکێکم بینی بە کەیفی خۆی دەخولایەوە، لە هەر شوێندا کە پێی خۆش بوو دەسووڕایەوە، گوتیان ئەمە پاداشی ئەوەیە دارێکی لەسەر ڕێی خەڵکی بڕیوە تا ئازاری هیچ کەس نەدا».

**ئەرکی سێهەم**، لە هەمبەر کەسدا لووت بەرز نەبێ، چون پەروەردگار دەمارزلان بەدوژمنی خۆی دەزانێ. پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم پێمیفەرموو خۆ خواربگرە، تا کەس بەسەر کەسدا دەعیەو دەمار نەفرۆشێ». لەم سۆنگە بوو کە پێغەمبەر لەگەڵ بێوەژن و هەژاراندا دەڕۆیشت تا ئەوەی کاروباریانی بەجێ دەهێنا. نابێ بە سووکی سەیری کەس بکرێ، چونکە بۆی هەیە هەر ئەو کەسە یار و نزیکی پەروەرندەی بێ و ئەم پێی نەزانێ؛ پەروەردگار دۆستانی خۆی دادەشارێ تا کەس نەیانناسێ.

**ئەرکی چوارەم**، نابێ گوێ بۆ هیچ شۆفار و دووزمانێ ڕاگرێ، چونکە گوێ دەبێ بۆ پەیڤی ڕاست ڕاگیرێ، کەچی شۆفار[1] ئاکار پیسە. هەروەها لە خەبەردایە کە «هیچ دوو زمانێ ڕەنگی بەهەشت نابینێ». دەبێ لەوەش ئاگادار بی ئەوەی خراپەی خەڵکی لە لات گوت، لە باسی تۆش هیچ لانادا. دەبێ خۆتی لێ بپارێزی و بە درۆزنی بزانی.

**ئەرکی پێنجەم**، لە هیچ ناسیاوێ پتر لە سێ ڕۆژان لالووت نەبێ. پێغەمبەر فەرمووی: «ڕەوانییە پتر لە سێ ڕۆژ دەگەڵ برای موسوڵمانت قسە نەکەی». هێژاترینیان ئەو کەسەیە کە بە سڵاوکردن پێشدەستی کا.

«عەکرەمە» دەڵێ: «پەروەردگار بە یووسفی گوت: بۆیە ئاست و پاگەتم بەرز ڕاگرت، چونکە لە سووچی براکانت خۆش بووی».

لە خەبەردایە کە «هەرکەس لە هەڵەی برادەری ببوێری، بێجگە لە هێژایی و گەورەیی چیدی تووش نابێ».

**ئەرکی شەشەم**، دەگەڵ هەمووواندا بەچاکە هەڵس‌وکەوت کە؛ چ ئەو کەسە چاک بێ یان خراپ. لە

---

١- شۆفار: نێوان تێکدەر.

خەبەرایە کە «تا دەتوانی دەگەڵ هەمووواندا چاکە بکە: ئەگەر ئەو کەسە شیاوی ئەو چاکەیە نەبوو، تۆ بۆ خۆت شیاوی».

لە خەبەرایە کە «مەرجی ئاوەزدار بوون، پاش بڕوا، دۆستایەتییە لە گەڵ خەڵکی و چاکە کردن دەگەڵ خاس و خراو». بووهورەیرە دەڵێ: «کاتێ کەسێک دەستی پێغەمبەری دەگرت تا لەگەڵی قسە بکات، قەد دەستی نەدەکێشایەوە تا ئەوەی کە ئەو کەسە دەستی دەکێشایەوە؛ هەرکەس دەگەڵی دەئاخاوت، بەتەواوی رووی لەو بوو تا دوایی بهاتایە».

**ئەرکی حەوتەم،** دەبێ ڕێز لە پیران بنێ و لەگەڵ زارۆکان دلۆڤان بێ؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی ڕێزی بە سالاچووان نەگرێ و بە بەزەییەوە سەیری منداڵان نەکا، لە ئێمە نییە». هەروەها فەرمووی: «ڕێز گرتن لە پرچی سپی، ڕێزگرتنی پەروەردگارە». هەروەها: «هەرگەنجێ کە ڕێزی لە پیرێ گرت، پەروەردگار لاوێکی بۆ تەرخان دەکا تا لە سەردەمی پیریدا ڕێزی لێ بگرێ». ئەمە مزگێنییەکە بۆ تەمەن درێژ بوون؛ چونکە هەرکەس هەلی پەرای پیرانی بۆ بڕەخسێ، بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە دەگاتە تەمەنی پیری تا پاداشی کردەوەی بدرێتێ.

کاتێ پێغەمبەر لە سەفەر دەگەڕایەوە، منداڵانیان دەبردە بەرەو پیریەوە: لەسەر چارموا هەندێکی لە پێش و هەندێکی لە پاش خۆی دادەنا. دواتر ئەو منداڵانە شانازییان پێکتر دەکرد و دەیانگوت: «پێغەمبەر منی لە پێش خۆی داناو تۆی لە پاش خۆێ». هەرگا ساوایەکیان بۆ ناولێنان یا دوعای خێر دەهێنایە لای پێغەمبەر، لە کۆشی دەگرت و دەیدواند. هەندێ ساوا لەئامێزی پێغەمبەردا خۆیان پیس دەکرد. دایک و بابیان هاواریان دەکرد و دەیانویست منداڵەکەیان لابەن؛ کەچی پێغەمبەر دەیفەرموو: «وازی لێ بێنن با خۆی پیس کاو بە تەواوی خۆی راحەت کا». هەروەها لە لای ئەو کەسەدا دادەنیشت تا شەرمەسار نەبێ و پاش چوونەوەی ئەو، خۆی پاکژ دەکرد.

**ئەرکی هەشتەم،** دەبێ دەگەڵ هەموو کەسدا رووگەش و زمان خۆش و لێوبەبزە بێ. پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم مرۆڤی رووگەش و ئاسانگری زۆر خوش دەوێ». دیسان فەرمووی: «چاکەکارییەک کە دەبێتە هۆی لێبوردنی خودا گەلێک سانایە: ئەوەش رووی گەش و گفتی خۆشە».

ئەنەسی مالک دەڵێ: «پێغەمبەر لە کولانێکدا رادەبورد، پیرەژنێکی هەژاری تووش بوو. گوتی کارێکم پێتە. پێغەمبەر فەرمووی: لەم کۆڵانەدا لە هەر جێ کە پێت خۆشە دابنیشە تا بۆ قسەت گوێ راگرم. پاشان لە هەمبەری دانیشت و گوێی بۆ شل کرد».

**ئەرکی نۆهەم،** نابێ دەگەڵ هیچ موسولمانێ بێ بەڵێنی کا. لە خەبەردایە کە «سێ شت هەیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە موسولمان ببێتە دوڕوو، ئەوانەش بریتین لە: پەیڤی درۆ، بێ بەڵێنی و

خەیانەت لەئەمانەت».

**ئەرکی دەهەم**، رێزی هەرکەس بە قەدەر خۆی رابگرێ: ئەوەی هێژاتر بێ، لەنێو خەڵکیدا رێزی زۆرتری لێ بنێ.

عایشە لە سەفەردا بوو. سفرەی راخست؛ هەژارێکی بە سەردا تێپەڕی. گوتی: «نانێکی بدەنێ». سوارێ رابورد: «گوتی داوەتی بکەن». لێیان پرسی: «بۆچ هەژارەکەت بە پارووە نانێک بەڕێ کرد و ئەو دەوڵەمەندەت بانگ کرد؟» گوتی: «پەروەردگار بۆ هەرکەسە ئاست و پاگەیەکی داناوە و ئێمەش دەبێ ئەو ئاستە راگرین. ئەو هەژارە بە نانێک شادوشوکر دەبێ، بەلام پارووە نانێ بۆ ئەو دەوڵەمەندە سووکایەتییە. دەبێ وابێ کە ئەویش پێی شاد بێ».

لە خەبەردا هاتووە کە: «کە کەسێکی هێژا و بەڕێز لە هۆزێکی دی هاتە لاتان، رێزی لێ بنێن». کەسی وابووە کە پێغەمبەر بالاپۆشی خۆی بۆ کردۆتە رایەخ. پیرەژنێ کە بە کورپەیی شیری پێ دابوو، هاتە لای. بەڕێز و حورمەتەوە لەسەر بالاپۆشی خۆی دایناو گوتی: «سلاو دایەگیان! هەرچیت دەوێ بفەرموو تا پێتی بدەم». دەسکەوتێ کە لە شەڕدا بەری کەوتبوو، پێی بەخشی. عوسمان بە سەدهەزار درهەم لێی کڕی.

**ئەرکی یازدەهەم**، دەبێ هان بدا کە نێوانی دوو موسوڵمانی لێک زیزبووی دابڕاو خۆش کاتەوە، چونکە پێغەمبەر فەرمووی «پێتان بڵێم چ شتێ لە نوێژ و رۆژوو و خێرات هێژاترە؟» گوتیان «بفەرموو». فەرمووی: «ئاشت کردنەوەی موسوڵمانان».

ئەنەس گوتی: رۆژێ پێغەمبەر دانشتبوو؛ پێدەکەنی. عومەر گوتی: دایک و بابم با ساقەت بن! بۆ پێدەکەنی؟» گوتی: لەرۆژی پەسلاندا دوو موسوڵمان بۆ دادخوازی لەلای پەروەردگار چۆکیان دادا. یەکیان گوتی: «پەروەرندەم! ئەم زەلامە ستەمی لێ کردووم، دادم لێی بستێنە». پەروەردگار دەڵێ: «حەققی بدە». دەڵێ: ئەزبەنی[1]! دوژمنانم هەموو چاکەکانیان بردم، هیچم پێ نەماوە». پەروەردگار بە ستەم لێکراو دەڵێ: «دەبێ چ بکا؟ هیچ چاکەیەکی پێ نەماوە». دەڵێ «گەورەم! گوناحەکانمی بۆ بخەرە سەر». گوناحەکانیان خستە سەر ئەویترو هێشتا مابووی. لێرەدا پێغەمبەر فرمێسکی لە چاوان هاتە خوار و گوتی: «ئەمەیە ئەو رۆژە گەورەی کە هەرکەس چاوەڕوانە بارێکی لە کۆڵ لابەرن». پەروەردگار بەستەم لێ کراوی گوت: «رووت وەگێڕە، بزا چ دەبینی». رووی گێڕاوە، گوتی: «ئەزبەنی! باژێرێ دەبینم لە زیو و کۆشکی زێڕی بە گەوهەر و مروارید خەملاو. پەروەرندەم! ئەمە بەشی کام پێغەمبەر، یا کام مێرخاس یان شەهیدە؟» پەروەردگار گوتی: «هی ئەوەیە بیکڕێ و

---

١- ئەزبەنی: گەورەم.

پارەکەی بدا». گوتی «گەورەم! کێ نرخی ئەمەی پێی دەدرێ؟» گوتی: تۆ. گوتی خودایا بە چی؟» گوتی: «بەوەی کە لەم برادەرەت خۆش بی». گوتی: «خوایا! ئەوە لێی بوردم». پەروەردگار گوتی: «دەسا هەستەو دەستی برات بگرەو بچنە نێو بەهەشتەوە». پاشان پێغەمبەر فەرمووی: خەڵکی پێکرا ئاشت بدەنەوە، چونکە پەروەردگار لەرۆژی پەسڵاندا موسوڵمانان پێکرا ئاشت دەکاتەوە.

**ئەرکی دوازدەهەم**، کەمایەسی وشەرم و شوورەیی موسوڵمانان بشارێتەوە؛ چونکە لە خەبەردا هاتووە کە «ئەوەی لەم دونیایەدا پەردە لە کەمایەسی موسوڵمانان لانەدا، پەروەردگار لە رۆژی پەسڵاندا پەردە بەسەر گوناحەکانیدا دەدا».

ئەبووبەکری سدیق دەڵێ: «تووشم هات بەهەرکەسێکەوە گەر دز بوو یا خۆ مەیخۆر، وام پێ خۆشە کە پەروەردگار ئەو گوناحەی ئاشکرا نەکا».

پێغەمبەر فەرمووی: «ئەی ئەوانەی کە بڕوایەکی سەرزارەکیتان هێناوە هەنووکە ئیمان نەگەیوەتە دڵتان! خوسپەی خەڵک مەکەن، کەمایەسی خەڵک مەدۆزن؛ چونکە هەرکەس ویستی پەردە لە سەر کەمایەسی کەسێ لا بدا، پەروەردگار ئابرووی دەباو تڕۆی دەکا، هەرچەن لە ژووری خۆیدا بێ».

ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «لە یادمە کابرایەکی دزیان هێنایە پەرای پێغەمبەر تا دەستی ببڕن. رەنگ لە رووی پێغەمبەر نەما. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەم کارە بێزت دێ؟ فەرمووی: بۆچ بێزم نەیێ؟ بۆچ ببمە یاریکاری شەیتان لەئازاری برادەرانم؟ ئەگەر ئەنگۆ پێتان خۆشە، پەروەردگار لە گوناحەکانتان خۆش بێ، ئێوەش هەڵەی برادەرەکانتان بشارنەوە و ئاشکرای مەکەن؛ چونکە کە کار گەیشتە لای خونکار، بێجگە بەڕێوەبردنی "حەد" هیچ چار نامێنێ».

عومەری خەتتاب شەوێک خەریکی پاسەوانی بوو، گوێی لە بەزمێ بوو. لە خانووێکەوە رۆیشتە سەربان و رۆیشتە نێو ئەو خانیەوە. دی ژن و پیاوێک پێکرا دانیشتوون و خەریکی خواردنەوەن. گوتی: «ئەی دوژمنی خودا! پێت وایە خوداوەند لەم تاوانەت خۆش دەبێ؟» گوتی: «ئەی ئەمیرەلمؤئمنین! زۆر پەلە مەکە، گەر من خەریکی گوناحێک بووم، تۆ سێ گوناحت تووش بوو: پەروەردگار گوتی: وَلَا تَجَسَّسُوا[1] تۆ پشکنیت؛ گوتی: وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا[2]،کەچی تۆ لەسەر بانەوە هاتیتە خوار؛ گوتی: لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَىٰ أَهْلِهَا[3]، گوتوویە بە بێ ئیزن سەر بە هیچماڵێکدا مەکەن و سڵاوکەن؛ کەچی تۆ بە بێ ئیزن هاتیە ژوورێ و سڵاوت نەکرد». عومەر گوتی: «ئەگەر ئێستا بتانبوورم، تۆبە دەکەن؟» گوتی: «ئەرێ، گەر

---

١ - قورعان (١٢/٤٩) شتی بشراوە مەپشکنن.

٢ - قوعان (١٨٩/٢) لە درگاوە بڕۆنە ژوور.

٣ - قورعان (٢٧/٢٤) بێجگە ماڵی خۆتان سەر بە هیچ ماڵا وا مەکەن، هەتا ئیزنتان نەدەن وسڵاوبۆ خەڵکەکەی داخەن.

بمبووری قەد ئەم کارەم دووپاتە ناکەمەوە». عومەر لەو بورد و ئەویش لە گوناحی پاشگەز بوو.

پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی کوڵە بە خەڵکی بگرێ، پەروەردگار لە رۆژی پەسلاندا قورقوشمی تواوەی لە گوێ دەکا».

**ئەرکی سێزدەهەم،** خۆ لە بوختان و هەڵبەستە بپارێزێ، تا دڵی موسوڵمانان لە درۆنگی و زمانیان لە خوسپە بپارێزێ؛ چونکە هەرکەس ببێتە هۆی گوناحبارکردنی کەسێک، لەو گوناحەدا بەشدارە. پێغەمبەر فەرمووی: «چۆنە کەسێک جنێو بەدایک و بابی خۆی بدا؟» گوتیان: «کێ وادەکا ئەی پێغەمبەری خودا؟» فەرمووی: «ئەوەی جنێو بەدایک و بابی خەڵک دەدا، تاکوو خەڵک جوێن بەدایک و بابی بدەنەوە؛ ئەو کەسە خۆی جنێوی بە خۆی داوە».

عومەری خەتتاب گوتی: «هەرکەس لە شوێنی گوماناویدا رابوەستێ، بۆی نییە لۆمەی خەڵکی کا کە بۆ لێم درۆنگن».

لە کۆتایی رەمەزاندا پێغەمبەر لە مزگەفتدا لەگەڵ سەفیە قسەی دەکرد. دوو زەلام لەوێ رابوردن. پێغەمبەر بانگی کردن و فەرمووی: «ئەمە خێزانمە، سەفییە». گوتیان: «ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر لە هەموو کەس گومان خراپ بین، کەس لە تۆ بە گومان نابێ». فەرمووی: «شەیتان لە لەشی مرۆدا وەکوو خوێن لەدەماردا لە گەڕایە».

عومەر پیاوێکی دی کە لە نێو رێدا دەگەڵ ژنێ دەئاخافت. بە قەمچی لێی دا. گوتی: «ئەمە خێزانمە». گوتی: «بۆچ لە شوێنێکدا قسەی لەگەڵ ناکەی کە کەس نەتبینێ؟»

**ئەرکی چواردەهەم،** ئەگەر پلەو پاگەیەکی بوو، خۆی لە تکا کردن بۆ کەس نەبوێرێ. پێغەمبەر بەیارانی خۆی گوت: «داوای نیازم لێ بکەن، زۆرم لەدڵدایە کە بتاندەمێ، بەڵان رایدەگرم تا لێمی تکا کەن و پاداش بەرن». فەرمووی: «هیچ سەدەقەیەک هێژاتر لە خێری زمان نییە». گوتیان: «چۆن؟» فەرمووی: «تکایەک کە ببێتە هۆی نەڕژانی خوێنێک، نەفەوتانی قازانجێک، یا خۆ وەرگێڕانی ئازارێک».

**ئەرکی پانزدەهەم،** ئەگەر بیستی کەسێک لە پشت سەر موسوڵمانێکەوە زاری خستۆتە گەڕو تەمای لە ماڵ و گیانیە، بە جێی ئەو موسوڵمانە پەرسڤی وەربگێڕێتەوە و بەر بەو ستەمکاریە بگرێ؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس لە شوێنێکدا کە پەیڤی کرێت بە موسوڵمانێ دەڵێن، بەرپەرچی قسەیان بداتەوەو بە یارمەتی ئەو موسوڵمانە بێتەزمان، پەروەرندەی لە شوێنێکدا کە نیازی بێ، فریای دەکەوێ؛ ئەو موسوڵمانەش کە لەو کاتە بێدەنگ بێ و دەگەڵ خوسپەکەر بەتوندی نەدوێ، لەو کاتەدا کە زۆر بە نیازە، خوا ئاوڕی لێ ناداتەوە».

**ئەرکی شانزدەهەم:** کە تووشیاری زمانکرێتێک بوو، بە نەرمی دەگەڵی بدوێ تا لێی دەخەلسێ و

هیچ بە توندی دەگەڵی نەدوێ».

ئیبنی عەبباس لەراڤەی ئەم ئایەتەدا «وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ»[1] گوتی بە سڵاو پەرسڤی جنێو بدەنەوە.

عایشە دەیگوت: پیاوێک ئیزنی خواست بگاتە پەرای پێغەمبەر؛ فەرمووی: «ئیزنی بدەنێ، ئەمە بە پیاو خراپی لەنێو هۆزی خۆیدا بە ناو بانگە». کە هاتە ژوور، پێغەمبەر ئەوەندەی رێز لێ ناو پیاوەتی دەگەڵ کرد، پێم وابوو لەنزیکانی پێغەمبەرە. کە رۆیشتەوە لێم پرسی: «تۆ گوتت پیاو خراپەو کەچی گەلێک رێزت لێنا». گوتی: «عایشە! خراپترین کەس لە لای پەروەردگار ئەو کەسەیە کە خەڵک لەترسی زمانی رێزی بگرن».

لە خەبەردا هاتووە کە «هەر کار کە بۆ پاراستنی ئابڕووت لەزمانی بەدگۆیان کەی، بە سەدەقە دێتە هەژمار».

**ئەرکی حەڤدەهەم**- دەبێ دۆستایەتی هەژاران بکا و لە هاتوچۆی دەوڵەمەندان خۆ ببوێرێ. پێغەمبەر فەرمووی: «لەگەڵ مردووان دامەنیشن». گوتیان: «ئەوانە کێن؟» فەرمووی: «دەوڵەمەندان».

سلەیمان لە وڵاتی خۆدا، لە هەرکوێ بەلەنگازێکی دەبینی، لەلای رۆدەنیشت و دەیگوت: «هەژارێ دەگەڵ هەژارێ دانیشتن». عیسا هیچ نازناوێکی پتر لەوە پێ خۆش نەبوو کە پێی بڵێن: هۆ هەژار.

پێغەمبەر لە سکاڵایدا دەیگوت: «پەروەرندەم! تا زیندووم بە هەژاری بژیم، کە مردم، دەگەڵ هەژاران بمرم، کە لە رۆژی پەسڵاندا رابووم، لەگەڵ هەژاران رابم». مووسا گوتی: «پەروەرندەم! لەکوێرا بتبینمەوە؟» فەرمووی: «لەلای دڵ شکاوان».

**ئەرکی هەژدەهەم،** هان بدا تا دڵی موسوڵمانێ خۆش کاو نیازێکی بۆ پێک بێنێ. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی نیازی موسوڵمانێ پێک بێنێ، وەکوو ئەوەیە هەموو تەمەنی پەرای پەروەرندەی کردبێ». دیسان فەرمووی: «ئەوەی چاوی موسوڵمانێ روون کاتەوە، پەروەردگار لەرۆژی پەسڵاندا چاوی روون دەکاتەوە». هەروەها گوتی: «ئەوەی بەرۆژ یان بە شەو، ماوەیەک بپەرژێتە سەر پێک هێنانی کاری موسوڵمانێ، چ پێکی بێنێ و چ نەیهێنێ، چاتر لەوەیە کە دوو مانگ لە مزگەفتدا زاویە بگرێ». دیسان گوتی: «ئەوەی خەمبارێ لە خەم دەربێنێ، یا ستەم لێکراوی راپسکنێ، پەروەردگار حەفتا و سێ گوناحی لە کۆڵ دەخا». هەروەها: «برادەری خۆت یارمەتی بدە، چ ستەمکار بێ و چ ستەم لێکراو». گوتیان: «کە ستەمکار بوو چۆنی یاری دەین؟» فەرمووی: «راگرتنی لە ستەمکردن

---

[1] - قورعان (٢٢/١٣) بە چاکە خراپەکانیان دەسڕنەوە.

یارمەتییە». دیسان فەرمووی: «دوو کار هەیە کە هیچ عیبادەتێ لێی سەرتر نییە: بڕوا هاوردن، رەزای خەلکی بەدەست هێنان». هەروەها: «ئەوەی خەمی موسوڵمانانی نەبێ، لەوان نییە».فوزەیلیان دی دەگریا، گوتیان چییە خوێن لەچاوت دێتەخوار؟ گوتی: «موسوڵمانێکی هەژار زوڵمی لێکردم؛ زۆر بۆی پەشێوم؛ چونکە سبەی، لە رۆژی پەسلاندا لێی دەپرسنەوە و شەرمەسار دەبێ و هیچ دەرەتانی بۆ نییە».

مەعرووفی کەرخی دەڵێ: « هەرکەس رۆژی سێ جار بڵێ: اَللّٰهُمَّ اَصلِحْ اُمَّةَ مُحَمَّد، اَللّٰهُمَّ اَرْحِمْ اُمَّةَ مُحَمَّد، اَللّٰهُمَّ فَرِّجْ عَنْ اُمَّةَ مُحَمَّد، ناوی لەریزی ئەوالان دەنووسن».

**ئەرکی نۆزدەهەم**، بە هەرکەس کە گەیشت، بەر لە ئاخافتن سلاوی لێ بکاو تەوقەی دەگەڵ کا. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی بەر لە سلاو کردن هاتە قسە، وەرامی مەدەنەوە تا سلاو بکا».

یەکێک هاتە لای پێغەمبەر و سلاوی نەکرد؛ پێی گوت: «بگەڕێوەو پاش سلاو کردن وەرە ژوورەوە».

ئەنەس گوتی: هەشت ساڵ پەرایی پێغەمبەرم کرد، پێی گوتم: «ئەی ئەنەس! پاکژیت تەواو کە تا تەمەن درێژ بی؛ بە هەرکەس گەیشتی سلاو کە تا چاکەکانت زۆروزەوەند بێ و کە رۆیشتیتە نێو خانووێکەوە، لەدانیشتوانی سلاو کە تا ودم و خێری ماڵت پتر بێتەوە».

یەکێک هاتە لای پێغەمبەر و گوتی: «سلام علیکم». پێغەمبەر فەرمووی دەچاکەیان بۆی نووسیوە. یەکێکیتر هاتە ژوور و گوتی: «سلام علیکم ورحمة الله». گوتی بیست چاکەیان بۆی نووسی. یەکێکی-تر هات و گوتی: «سلام‌علیکم‌ورحمةالله وبرکاته». گوتی سی چاکەیان بۆی نووسی.

پێغەمبەر فەرمووی: «کە چوونە شوێنێک سلاو کەن، کە هاتنە دەریش دیسان سلاوکەن؛ چونکە سلاوی بەرین لەدواپین هێژاتر و سەرتر نییە».

فەرمووی: «کە دوو بڕوادار دەستی یەکیان گوشی، حەفتا پاداشیان پێ دەدرێ: شەست و نۆی بۆ ئەو کەسەیە رووگەشترو زمان خۆشتر بێ؛ کە دوو موسوڵمان پێک گەیشتن و سلاویان لێکتر کرد، سەد پاداشیان پێ دەدرێ؛ نەوەدی بۆ ئەو کەسەی سەرەتا سلاوی کردو دەی بۆ ئەوەی وەرامی دایەوە».

رامووسانی دەستی گەورەکانی دین سوننەتە. ئەبووعوبەیدەی جەڕراح دەستی عومەری رامووسی. ئەنەس دەڵێ لە پێغەمبەرم پرسی «کە پێک گەیشتین، لە هەمبەریەک پشت بچەمێنینەوە؟» گوتی: «نە». گوتم: «دەست بۆ دەست دان راکێشین» گوتی: «ئەرێ».

رامووسانی یەک پاش گەڕانەوە لە سەفەر سوننەتە، بەلام هەستانە سەر پێی پێ خۆش نەبووە.

ئەنەس دەڵێ: «کەس لەلامان بەرزتر و هێژاتر لە پێغەمبەر نەبوو، بەڵام لە بەرپێی رانەدەبووین، چونکە دەمانزانی زۆری لەلا کرێتە».

بەڵام ئەگەر کەسێک بۆ رێز لێنان -لە شوێنێکدا کە هەستان رەسم بێ- رابێ، نارەوا نییە؛ بەڵام دەستەونەزەر لەبەر کەسێکدا راوەستان، نەهی کراوە. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی پێی خوشە خۆی دابنیشێ و خەڵکی لەبەر پێی راوەستن، پێی بڵێن خۆی لە دۆزەهدا دەبینێتەوە».

**ئەرکی بیستەم**، ئەگەر کەسێک پژمەی بۆ هات دەبێ بڵێ: «الحمدلله». ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «پێغەمبەر پێ فێر کردین کە کەسێک پژمەی بۆ هات دەبێ بڵێ: "الحَمْدُ لله رَبِّ الْعالمین؛ کە ئەمەی گوت، کەسێ کە گوێی لێ بوو دەبێ بڵێ: "یَرْحَمُکَ الله" یان "یرْحَمُکَ ربّک"، کە ئەمەی گوت، ئەویتر بڵێ "یغْفِرُالله لِی ولَکُم". ئەگەر کەسێک "اَلحَمدُ لله"ی نەگوت، "یرْحَمُکَ الله"ی بەرناکەوێ».

پێغەمبەر بە دەنگی نزم دەپژمی و بەدەست یان دەسرۆک رووی دادەپۆشی. ئەگەر کەسێک لە ئاودەستدا پژمی، دەبێ لە دڵدا «الحمدلله» بڵێ . ئیبراهیمی نەفەعی گوتی: «ئەگەر بەزمانیش بڵێ هەر دەبێ».

کەعبی ئەحبار لەدەم مووساوە دەگێرێتەوە کە گوتی: «پەروەرندەم! گەر نزیکی تا بێدەنگ لەگەڵت بدوێم، گەر لێم دووری تا دەنگم هەڵبرم». گوتی: «هەرکەس یادم کا، دەبمە هاورازی». گوتی: «پەروەرندەم! هەندێ بارودۆخمان هەیە کە ناوێرین لەو کاتانەدا یادت کەین، وەکوو لەش پیسی و ئاودەست؛ دەبێ چ بکەین؟» گوتی: «لە هەر دۆخێکدا کە بووی یادم کەو هیچ خەمت نەبێ».

**ئەرکی بیست و یەکەم**، سەردانی نەخۆشی ئاشنا کا و لێی بپرسێ، هەرچەن ئەو کەسە برادەری نەبێ. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی سەردانی نەخۆش کا، بێ گومان لە بەهەشتدا دەحەسێتەوە؛ کە گەڕایەوە پەروەردگار حەفتا هەزار فریشتە تەرخان دەکا کە تا شەو درەنگان سەڵواتی بە سەردا ببارێنن».

سوننەت وایە کە دەست بنێتە سەر دەست، یا خۆ سەر جەمینی نەخۆش و لێی بپرسێ کە حاڵی چۆنە و بڵێ: «بِسم‌ِاللهِ الرَّحْمنِ الرَّحیم أُعیذکَ بِاللهِ الاَحَدِ الصَّمَدِ الذی لمْ یلِدْ ولَمْ یولَدْ ولَمْ یکُنْ لهُ کُفُواً اَحَدً منْ شَرِّ ما تَجد». عوسمان گوتی: «نەخۆش بووم، پێغەمبەر سەردانی کردم و چەن جار ئەمەی خوێند».

سوننەت ئەوەیە کە نەخۆش بڵێ: «أَعُوذ بِعِزةِالله وَقدرتهِ منْ شَرِّ مااَجدُ واُحاذر». ئەگەر کەسێک پێی گوت چۆنی، لەدەست نەخۆشییەکەی گلەوبناشت نەکا.

لە خەبەردا هاتووە کە کاتی بەندەیەکی پەروەردگار نەخۆش کەوێ، پەروەرندەی دوو فریشتەی

دەکاتە چاودێر، تا گەر کەسێک سەردانی کرد، سپاسی کاو گەر گلەی کرد، بڵێ: «خێرە؛ سوپاس بۆ خودایەک کە راهێنەری جیهانە». پەروەردگار دەڵێ «بەندەی من هی خۆمەو گەر بیگێڕمەوە، بە بەزەیی خۆم دەیبەمەوەو لە بەهەشتدا دەیحاوێنمەوە، گەریش چاکم کردەوە، تاوانەکانی بەم ئێش و ژانە دەسڕمەوەو گۆشت و خوێنێک، چاتر لەوەی کە هەبووی پێی دەدەمەوە».

عەلی گوتی: «هەرکەس ورگی بێتەژان، لە کابانی شتی لە مارەییەکەی داوا کا، کە بیداتێ هەنگوێنی پێ بکڕێ و دەگەڵ ئاوی بارانی تێکەڵ کاو بیخواتەوە، چاک دەبێتەوە؛ چونکە پەروەردگار بارانی بە پیرۆز زانیوە و هەنگوینی بۆ شیفا راناوەو مارەییەک کە ژنان ببەخشن، پاکژ و روونە؛ کە ئەم سێیە پێکرا کۆوە بوون، بێ گومان چاک دەبێتەوە».

بەکورتی نەخۆش دەبێ گلە و گازە و خوتە و بۆڵەی بە زاردا نەیێ، هیوادار بێ کە ئەو نەخۆشیە گوناحەکانی دەشوا. کە دەرمانی خوارد، هیوای بە پەروەرندەی بێ، نەک دەرمان. ئەوەی سەردانی نەخۆش دەکا، نابێ زۆر دابنیشێ، زۆر نەپرسێ، دوعای بە خێری بۆ بکاو بە خۆی بڵێ کە بە بۆنەی نەخۆشی ئەو کەسەوە خەمبارە. چاو لەدەرکە و ژووەکانیتر نەبڕێ. کە گەیشتە بەر دەرکی ماڵ، پێش چوونە ژوور ئیزن بخوازێ، لە بەرانبەر دەرکەدا رانەوەستێ، بۆ شوێنێکی دی بڕوانێ، بەهێوری دەرکەکە بکوتێ و نەڵێ: «هۆخولام!». کە پرسیاریان کرد «کێیە؟» نەڵێ «منم». بەڵام بە جێی «منم» بڵێ «سُبْحانَاللهِ وَاَلْحَمْدُلله»، هەرکەس دەرگای ماڵی نەخۆش لێدا، دەبێ هەروا بکا.

**ئەرکی بیست و دووهەم،** دەبێ لە پاش تەرمەوە بڕوا. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس جەنازەیەک بەڕێ کا، قیراتێ پاداشی هەیە؛ ئەگەر راوەستا تا نرایە نێو گۆڕ، دوو قیرات پاداشی هەیە؛ هەر قیرات چەن بەرانبەر کێوی ئۆحۆدە».

نەریتی بەڕێ کردن تەرم ئەوەیە کە بێدەنگ بێ و پێنەکەنێ و بیر لەمەرگی خۆی کاتەوەو لە پاش مەرگی خۆی رامێنێ. «ئەعمەش» گوتی: «تەرمێکیان بەڕێ دەکرد، نەمدەزانی ئازیەتباری کێم، چونکە هەموو خەڵکی یەک لە یەک زۆرتر خەمبار بوون». تاقمێ لەسەر تەرمێکدا خەمیان دەخوارد، گەورەیەک گوتی: «خەمی خۆتان بێ، چونکە ئەو سێ کۆڵی قورسی لە کۆڵ بووەتەوە: چارەی پێمێردی بینیوە، تاڵی گیان کێشانی چەشتووە، دڵەراوکێی دوارۆژیشی رەستووە».

پێغەمبەر فەرمووی: «سێ شت لە پاش تەرم دەڕوا: ژن و منداڵ و ئاکار؛ ژن و منداڵ دەگەڕێنە دواوەو ئاکار دەگەڵی دەمێنێتەوە».

**ئەرکی بیست و سێهەم:** سەردانی سەرقەبران کا و بە دوعای خێر یادیان کا و بۆ خۆشی پەند بگرێ و بزانی ئەمیش دەبێ پاش ئەوان لەم کۆنە هەوارە بار کا و بڕوا و ماڵی ئەمیش وەکوو ئەوان هەر قەبرێکەو بەس. سەفیانی سووری گوتی: «هەرکەس بە زۆری لە قەبری خۆی یاد کا، گۆڕی لە

پێش چاوانی دەبێتە باخێ لەباخەکانی بەهەشت، ئەگەر لە بیری کاو یادی نەکا بۆی دەبێتە ئەشکەفتێ لە ئەشکەوتەکانی دۆژەهـ».

«رەبیعی خەیسەم» -کە قەبری لە تووسایە- یەکێک بوو لە گەورەکانی تابعین. لە مالی خۆیدا گۆڕێکی هەلکەندبوو، هەر کات لەدلی خۆی وەڕەس دەبۆو، دەڕۆیشتە نێو ئەو قەبرەوەو ماوەیەک دەنووست. پاشان دەیگوت: «ئەی پەروەردگار! بمنێرەوە بۆ سەر دونیا تا قەرەبووی هەلەکانم کەم». پاشان رادەبوو بە خۆی دەگوت: «هۆی رەبیع! ناردرایتەوە سەر دونیا، هان بدە تا بەر لەوەی بە یەکجاری بارکەی و برۆی دوارۆژی خۆت ئاوەدان کەی».

عومەر گوتی پێغەمبەر لەسەر قەبرێکدا چۆکی داو بەکول گریا، من لێی نزیکتر بووم، لێم برسی: «بۆچی گریای، ئەی خۆشەویستی خوا؟» فەرمووی: «ئەمە قەبری دایکمە، لەپەروەردگار تکام کرد کە بیبینم و تکای لێبۆردنی بۆ بکەم. پەروەرندەم تکای سەردانی هێنامەدی، بەلام بۆ تکای لێبۆردنی ئیزنی نەدام: دلم هاتە کول و بە سەریدا گریام».

ئەمەی بێژرا سەرلەبەری ئەرکی موسولمانان بوو لە هەمبەر یەک، دەبێ بە وردی جێبەجێ بکرێ.

**ئەرکی هاوسێ لەسەر هاوسێ** - پێغەمبەر فەرمووی : «هاوسێی کافر یەک مافی هەیە، کەچی جیرانی موسولمان، دوو مافی هەیە. هاوسێش هەیە سێ مافی هەیە، ئەوەش بریتییە لە جیرانێ کە خزم بێ». دیسان فەرمووی: «ئەوەندە جوبرائیل بۆ راگرتنی مافی هاوسێ رایدەسپاردم، وام بەدلدا هات، جیران لەمیراتی جیران بەش دەبا». فەرمووی: «هەرکەس بە خودا و رۆژی پەسلان بڕوای هەیە، با ڕێز لە هاوساکەشی بگرێ». فەرمووی: «ئەوەی جیرانی لێی بە ئازار بێ، بە بڕوادار ناناسرێ». دیسان گوتی: «یەکەم کەسانێک کە لە رۆژی پەسلاندا لە نێوانیاندا دادوەری دەکرێ، دوو جیرانن». هەروەها گوتی: «هەرکەس بەردێکی لە سەگی جیرانی گرت، دلی هاوساکەی خۆی ئێشاند».

بە پێغەمبەریان گوت: «ژنێک هەیە رۆژ بە رۆژووە و شەو شەونخوونی دەکێشی، بەلام دلی دراوسێی لەخۆ دێشێنێ». فەرمووی: «جێگەی دۆژەهە». دیسان فەرمووی: «تا چل مالی ئەولاتر، بە دراوسێ دەزانرێن». زەهرا دەلێ: «چل خانووی لای راست، چل خانووی لای چەپ، چل خانووی بەر و چل خانووی پشت بە دراوسێ دێنە ئەژمار». دراوسێتی تەنیا نەڕەنجاندنی هاوسێ نییە، بەلکوو دەبێ چاکەی دەگەل کەی. لە خەبەردا هاتووە کە: «لە رۆژی پەسلاندا جیرانی هەژار، بەرۆکی هاوسێی دارای دەگرێ و دەلێ: "پەروەرندەم! لێی بپرسە بۆچی چاکەی دەگەل نەکردم و دەرکی خانووی لەسەر داخستم؟"».

مشک تەنگی بە یەکێ لە گەورەکان چنیبوو. گوتیان: «بۆچی پشیلەیەک ناهێنی؟» گوتی: «دەترسم مشکەکان لەترسی ئەو پشیلە برۆنە ماڵی جیرانم و ئەو شتەی بۆ خۆم نەمویستووە بۆ ئەوانم رەوا دیبێ».

پێغەمبەر فەرمووی: «دەزانن مافی هاوسێ چییە؟ ئەگەر یارمەتی لێ خواستی، وەهانای کەوی، ئەگەر داوای قەرزی لێ کردی، پێی بدەی، ئەگەر هەژار بوو، یارمەتی بدەی، ئەگەر نەخۆش بوو، سەردانی بکەی، ئەگەر کۆچی دوایی کرد، ئەسپەردەی بکەی، ئەگەر شاد بوو، شاباشی بکەی، ئەگەر خەمین بوو، سەرخۆشی بکەی؛ دیواری خانووت زۆر فرەهـ انەکەی، تا بەری خۆر و شنە بای لێ نەگری؛ ئەگەر میوەت خوارد، بەشی بنێری، ئەگەر پێت نەکرا بەدوور لەو بیخوەی؛ نەهێڵی منداڵت خواردن لەدەست بگرێ و لە پێش چاوی زارۆکی جیرانت بیخوا؛ هەروەها بەدووکەڵی چێشتخانەت نەیڕەنجێنی، مەگەر ئەوەی کە بەشی بنێری». دیسان فەرمووی: «دەزانن مافی جیران چییە؟ سوێند بەو کەسەی گیانی محەممەدی لەدەستایە، کەس مافی هاوسێی پێ نادرێ، مەگەر ئەوەی پەروەرندەی بەزەیی پێدا بێتەوە».

لە مافەکانی هاوسێ ئەوەیە کە لە بانی ماڵەوە، سەیری نێو ماڵی نەکەی؛ ئەگەر سەری دارێکی لە سەربانت دانا، بەرگری لێ نەکەی؛ رێگای ئاورۆی نەبەستی؛ ئەگەر خاکی کردە بەر دەرگات، لەگەڵی شەڕ نەکەی؛ گەر لە نهێنیەکی ئاگادار بووی، ئاشکرای نەکەی؛ بۆ گوێ گرتن لە قسەی، کرووشمە نەکەی؛ سەیری ژن و منداڵی نەکەی؛ زۆر سەیری کارەکەریان نەکەی. ئەمانە هەمووی بێجگە لە ئەرک و مافی موسوڵمانییە».

ئەبووزەری غەففاری گوتی: «دۆست و برام، پێغەمبەری هێژام پێی راسپاردم کە چێشتم لێنا، ئاوی زۆرتری تێکەم و بەشی جیرانم بنێرم».

یەکێک لە عەبدوڵڵای موبارەکی پرسی: «دراوسێکەم لە کۆیلەکەم گازندەی هەیە، ئەگەر بێبەڵگە لێی بدەم گوناحبارم، گەر لێی‌نەدەم دراوسێکەم لێم زیز دەبێ؛ دەبێ چ بکەم؟» گوتی: «راوەستە تا بەندەکەت تاوانێ کا کە شیاوی تەمبێ بێ. ئەو لێدانە وەدرەنگ خە تا هاوسێکەت گلەت لێ کات، ئەوسا لێی دە تا هەر دوو کێشەت لە کۆڵ کەوێ».

**مافی خزمان**: پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم دەڵێ: "من دلۆڤانم و خزمایەتی بەزەییە. ئەم ناوەم لەناوی خۆم هەڵینجاوە؛ ئەوەی پێوەندی لەگەڵ خزمان بێ، منیش دەگەڵیم، ئەوەش لێیان دابڕا، منیش لە ئەو دادەبڕم».

دیسان فەرمووی: «هەرکەس دەیەوێ تەمەنی درێژو خوانی رەنگین بێ، با لەگەڵ خزمانی چاک

بێ». دیسان فەرمووی: «پاداشی هیچ عیبادەتێ پتر لە سەردانی خزمان نییە؛ تەنانەت ئەگەر بنەماڵەیەکی هەرچیپەرچی بن، بە هۆی سەردانی خزمانەوە، ودم و بەرەکەت دەکەوێتە ماڵانەوە».
دیسان فەرمووی: «هیچ خێروسەدەقەیەک هێژاتر لەوەی نییە بیدەیتە خزمێ کە لە گەڵت شەڕی بووە».

خزم دۆستی ئەوەیە کە ئەوان لەتۆ دابڕن، کەچی تۆ هەر سەردانیان کەی. پێغەمبەر فەرمووی: «هێژاترینی هەموو کردەوەیەک ئەوەیە کە هەرکەس لێت دابڕا، تۆ سەردانی کەی، گەر بێبەشی کردی، تۆ بەشی بدەی، گەر ستەمی لێ کردی، تۆ بیبووری».

**مافی دایک و باب**- مافی ئەمان گەلێک گەورەترە، چونکە لێت زۆر نزیکترن. پێغەمبەر فەرمووی: «کەس ناتوانێ مافی بابی بە جێ بهێنێ، مەگەر ئەوەی بە کۆیلەیی ببینێ و بیکڕێ و رزگاری کا».
دیسان فەرمووی: «چاکەکردن دەگەڵ دایک و باب، هێژاترە لە نوێژو رۆژوو و حەج و عومرەو خەزا».
دیسان فەرمووی: «ئەوەی دڵی دایک و بابی نەیشاندبێ، بۆ رەزامەندیان تێکۆشابێ، تووشی دوعاو نزایان نەبووبێ، لە پانسەدساڵ رێگاوە بۆنی بەهەشتی دەگاتە بین».

پەروەردگار بە مووسای گوت: «هەرکەس پەرای دایک و بابی کا، بە خزمەتگوزاری خۆمی دەنووسم، هەرکەس فرمانی من جێبەجێ کا و گوێڕایەڵی ئەوان نەبێ، بەخزمەتگوزاری خۆمی نانووسم».

پێغەمبەر فەرمووی: «چ زیانێکی هەیە ئەگەر کەسێک خێرێک بدا لە رێی خودا، هەم خۆی پاداشی ئەو خێرەی بەردەکەوێ، هەم بە دایک و بابیشی دەدرێ و هیچ لە هی خۆی کەم ناکرێتەوە؟»

یەکێک هاتە لای پێغەمبەرو گوتی: «دایک و بابم کۆچی دواییان کردووە، چ مافێکیان لەسەر منە تا بەجێی بێنم؟» فەرمووی: «نوێژیان لە بۆ بخوێنەو لەلای خودا تکایان بۆ بکەو قەوینیتان بەجێ بێنەو رێزی دۆستانیان بگرەو سەردانی خزمانیان بکە».

**مافی منداڵان**: یەکێک لە پێغەمبەری پرسی: «چاکە دەگەڵ کێ کەم؟» فەرمووی: «دایک وبابت». گوتی مردوون. فەرمووی: «لەگەڵ منالت؛ چونکە هەر بەو جۆرەی دایک و باب مافیان هەیە، منداڵیش هەیەتی».

یەکیان ئەوەیە کە بە ئاکاری خراپی خۆت، تووشی گوناحی نەکەی. پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم رەحمەتی خۆی بەسەر ئەو بابەدا بڕژێنێ کە کوڕی خۆی تووشی گوناح و نافەرمانی

ناکا».

ئەنەس دەڵێ پێغەمبەر فەرموویە: «کە کوڕتان گەیشتە حەوت ڕۆژ، حەفتانەی بۆ بنێن، ناوی جوانی لەسەر دانێن، بە پاکژی ڕایگرن؛ کە بوو بە شەش ساڵ ڕایبێنن؛ کە بوو بە حەوت ساڵ نوێژی پێ فێر کەن؛ کە بوو بەنۆ ساڵ نوێنی جیا کەن؛ لە دە ساڵاندا بەبۆنەی نوێژ نەکردن تەمێی کەن؛ لە شازدەدا ژنی بۆ بێنن و بابی دەستی بگرێ و بڵێ: "رامهێنای، قورعانم پێ فێر کردی، ژنیشم بۆ هێنای. لە شەڕو ئاژاوەی دونیا و دوارۆژت هانا دەبەمە بەر پەروەرندەم».

دەبێ دایک و باب لە بەخشین و نازکێشانی منداڵاندا دووچاوەکی نەکەن. هەروەها ڕامووسان و نازکێشانی منداڵی ساواش سوننەتە. پێغەمبەر حەسەنی رادەمووسی، «اقرع بن حابس» گوتی: «دە منداڵم هەیەو هێمان کەسیانم ماچ نەکردووە». پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی بەزەیی بە کەسدا نەیێتەوە، کەس بەزەیی پێیدا نایەتەوە».

پێغەمبەر لەسەر مینبەر بوو، لەناکاو حەسەن بە دەمدا کەوت؛ پێغەمبەر بلەز هاتە خوارەوەو ئەم ئایەتەی دەخوێند: إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٌ.[1]

جارێک پێغەمبەر نوێژی دەکرد، لە کڕنۆشدا بوو کە حسەین سواری پشتی بوو. پێغەمبەر ئەوەندە کڕنۆشەکەی درێژە پێدا کە یارانی پێیان وابوو بە پێغەمبەر وەحی کراوە کە کڕنۆش درێژە پێبدا. کە سلاوی نوێژەکەیان دایەوە، لێیان پرسی: «مەگین وەحی هاتووە کە سوجدە درێژ بکرێتەوە؟» فەرمووی: «نە، نە! حوسەین منی کردبووە حوشتری خۆی، نەمویست لێی تێکدەم».

بە کورتی مافی دایک و باب، گرینگترە تا هی منداڵ، چونکە ڕێزلێنانی ئەوان بەسەر منداڵان فەرز و پێویستە و پەروەردگار لەگەڵ پەرستنی خۆی هاوشان ڕایناوە: وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًا.[2]

بۆ ڕێز گرتنی دایک و باب منداڵ دوو ئەرکی لەسەر پێویستە: یەکەم ئەوەی زۆربەی زانایان پێیان وایە کە ئەگەر خواردنێ گومان لەسەر ڕەوابوونی بێ و بە تەواوی حەرام نەبێ و دایک و باب بڵێن بیخۆ، دەبێ بیخوا؛ چونکە دڵنیایی و دڵخۆشی ئەوان گرینگتر لە خۆ بواردن لە لێلی و گومانە. دووهەم ئەوەیە کە بە بێ ئیزنی وان بۆ هیچ سەفەرێ نەڕوا، مەگەر ئەو سەفەرە «فرض عين» بێ، وەکوو سەفەر بۆ فێربوونی نوێژو ڕۆژوو (گەر لەو دەڤەرەدا شارەزایەک نەبێ). تەنانەت بە بێ ئیزنی

---

١ - (قورعان؛ ١٥/٦٤) بەڕاستی کە ماڵ و منالتان هۆی ئاژاوەو زیانتانن.

٢ - (قورعان؛ ٢٣/١٧) پەروەرێنت فەرمانی دا کە بێجگە لەو مەپەرستن؛ لەگەڵ دایک و بابیشوو چاکە کەن.

دایک و باوک ڕۆیشتن بۆ حەج ناڕەوایە، هەرچەند حەج فەرزە، بەڵام دەکرێ وەدرەنگ بخرێ.

یەکێک ئیزنی لە پێغەمبەر خواست کە بۆ خەزا بڕوا. پێی گوت: «دایکت هەیە؟» فەرمووی: «هەمە». فەرمووی: «لە لای دایکت بمێنەوە، چونکە بەهەشتی تۆ لە ژێر پێی دایکتایە».

یەکێک لە وڵاتی یەمەنەوە هاتە لای پێغەمبەر، ئیزنی چوونە خەزای لێ خواست؛ فەرمووی: «دایک و بابت هەیە؟» گوتی: «هەمە». فەرمووی: «سەرەتا ئیزنیان لێ بخوازە؛ ئەگەر نەیاندا، گوێیان بۆ شل کە. چونکە پاش پەرستنی خودا هیچ شت وەکوو پەرای ئەوان لە پەروەرێنت نزیک ناکاتەوە».

مافی برای گەورە لە مافی باب زۆر نزیکە؛ لە خەبەردا هاتووە کە «مافی برای گەورە بەسەر برای بچووکدا وەکوو مافی باوک و فرزەندە».

**مافی بەندەکان**- پێغەمبەر فەرمووی: «لە خودای گەورە ترسوو بێ لەمەڕ بەندەکانتان. لەو خواردنەی کەخۆتان دەیخۆن بدەنە ئەوانیش، لەو جلکەی کە خۆ دەیکەنە بەر، بکەنە بەریان؛ کارێکیان مەخەنە ئەستۆ کە لە چارەی دەرنەیەن. ئەگەر لە بار بوون، ڕایانگرن، ئەگەر نە، بیانفرۆشن. ئافرێندراوانی پەروەرندەتان ئازار مەدەن، چونکە خودا کردوونیەتە ژێر دەستی ئێوە و هەر ئەو خودایەش دەتوانێ ئێوە بکاتە ژێردەستی وان». یەکێک پرسی: «ئەی پێغەمبەر خودا! ڕۆژی چەن جار لە بەندەکانم ببوورم؟» فەرمووی: «حەفتا جار».[1]

لە «واخیف قیس»یان پرسی: «پشوو درێژی لەکوێ فێربووی؟» گوتی: «لەقەیسی قاسم. جارێک کارەکەرێکی شیشە کەبابێکی برێژراوی، بۆی دەهێنا، لە پڕ لە دەستی بەربوو و کەوت بەسەر کورپەیەکی ساوایدا و کوشتی. کارەکەرەکە لەترسی مردنی ساوا، بوورایەوە. قەیس گوتی: "خەم مەخۆ، هیچ سزایەکت نادەم و لەبەر ڕەزای پەروەرندەم لێت دەبوورم و ئازادت دەکەم"».

عەون کوڕی عەبدوڵڵا هەرکات یەکێک لە بەندەکانی سەربزێوییەکی لێ دەوەشایەوە، دەیگوت: «بەڕاستی کە کێشاوتە سەر خووی خودانی خۆت؟ هەرچەن خێوەکەت لە هەمبەر خودای سەرپێچی دەکا، تۆش لەهەمبەر من وادەکەی».

ئەبو مەسعوودی ئەنساری، بەندەیەکی بوو، جارێک لێی دەدا. یەکێک بانگی کرد و گوتی: «های ئەبامەسعوود! دەست ڕاگرە». ئاوڕی دایەوە، پێغەمبەری دی؛ پێی گوت: «چا بزانە. پەروەرندەت بەسەر تۆدا زاڵترە، تا تۆ بەسەر ئەودا».

کەواتە، مافی بەندە ئەوەیە کەلە نان و پێخۆری خۆتی پێ بدەی، لە جلکی خۆتی دەبەرکەی، بە سووکی سەیری نەکەی، ئەوە بزانی کە ئەویش مرۆڤێکە وەکوو خۆت؛ کە هەڵەیەکی کرد، لەو

---

[1] - مەبەست لە حەفتا جار، لێبوردنی زۆرە. (ئامێدیان)

هەلانەی لە هەمبەر خودانی خۆت کردووتە رامێنە، کە لێی تووڕە بووی، لە تووڕەبوونی پەروەردگار لە خۆت بترسە.

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس ژێردەستی خواردنێکی بۆ لێناو هیچی بۆ خۆی دانەنا، با لە لای خۆی داینێ‌و لەخواردندا هاوبەشی بێ، گەر واشی نەکرد، پارویکی چاکی بۆ بگرێ و بەدەستی خۆی لەسەر زاری نێ و بە زمان پێی بڵێ "بخۆ"».

## بنەمای شەشەم - نەریتەکانی لە خەڵک دابڕان و زاویە گرتن

زانایان لەسەر ئەمەی کە دەگەڵ خەڵکبوون هێژاترە یا دابڕان لەخەڵک، پەیڤی جۆراوجۆریان هەیە. سەفیانی سووری و ئیبراهیمی ئەدهەم و داوودی تایی و فوزەیلی عەییاز و سلەیمانی خەوواس و یووسفی ئەسبات و حوزەیفەی مەرعەشی و بیشری حافی و زۆر لە پارێزکاران و گەورەکان، رایان وایە کە دوورەپەرێزی لە خەڵک چاترە؛ عومەر دەیگوت: «بەشی خۆتان لە خەڵک دابڕن». ئیبنی سیرین دەڵێ: «دوورەپەرێزی عیبادەتە».

یەکێک بەداوودی تایی گۆت: «مۆچیاریم کە». گوتی: «رۆژووی دونیا بگرەو ئەو رۆژووەت تا کاتی مردن مەکەرەوە؛ خۆت لە خەڵکی ببوێرە، بەو چەشنەی خۆت لە شێری دڕندە دەبوێری».

حەسەنی بەسری دەڵێ: «لە تەوراتدا هاتووە کە مرۆ قەناعەت بکاتە پیشەی خۆی، بێ نیاز دەبێ؛ لە خەڵک دابڕێ، بێوەی دەبێ؛ نێلەتوون بکاتە مل شاوەت، خۆی دەرباز دەکا؛ لە چاوچنۆکی دەست هەڵبگرێ، مێرخاسی خویان دەبێ؛ کە پشوودرێژ و لە سەرخۆ بێ، لەرۆژی پەسلاندا بێ نیاز دەبێ».

«وُهَیْب بن الورد» گوتی: «ژیری دەیە: نۆی لە بێدەنگیدایە و دەهەمی لەدوورەپەرێزی». رەبیعی خوسەیم و ئیبراهیمی نەخەعی گوتوویانە: «بەزانست رابێ و لە خەڵک دابڕە».

مالک کوڕی ئەنەس هەم سەردانی یاران ونەخۆشانی دەکرد، هەمیش لە ئەسپەردەی مردوودا بەشداری دەکرد. دواتر یەکەیەکە وازی لە هەمووی هێناو خۆی پەستاوتە سووچێ. فوزەیل گوتی: «ئەوەی بە لامدا تێپەڕا و سلاوی لێ نەکردم، یان نەخۆش بووم و سەردانی نەکردم، بەڕاستی کە چاکەی لەگەڵ کردووم».

سەعدیوەققاس و سەعید کوڕی زەید لە یارانی نزیکی پێغەمبەر بوون؛ لە دەڤەری مەدینەدا دادەنیشتن؛ لە شوێنێکدا کە پێیان دەگوت «عەقیق». بۆ هیچ کارێ -تەنانەت نوێژی هەینی- ئاوێتەی خەڵکی نەبوون تا مردن.

یەکێک لەخونکاران بە حاتەمیئەسەممی گوت: «کارێکت هەیە بۆت پێک بێنم؟ » گوتی: «هەیە». گوتی: «بڵێ» . گوتی: «ئەوەی کە نە بمبینی و نە بتبینم».

یەکیک بە «سەهلی توستەری» گوت: «پێم خۆشە پێکڕا برادەر بین». گوتی: «کەیەکێکمان مردین، ئەویترمان لەگەڵ کێ دەبێتە برادەر، ئێستاش با لەگەڵ ئەو کەسە بێ».

بۆ ژن هێنان، یا مێرد کردنیش هەمان کێشە دێتە گۆڕێ؛ هەندێ پێیان چاترە و هەندێ نە. ڕاستیەکەی ئەوەیە، بۆ هەرکەسە جیاوازە: کەس هەیە دوورەپەرێزی بۆی چاترە و کەسیش هەیە تێکەڵبوون دەگەڵ خەڵکی بۆی هێژاترە. ئەمەش لە کەس خویان نابێ تا چاک وخراپی لە خەڵکدابڕان بە وردی لێک نەدرێتەوە.

## بەهرەکانی دوورە پەرێزی

دوورگرتن لە خەڵک شەش بەهرەی هەیە:

**بەهرەی یەکەم**: ڕەخسانی هەل ومەودای چاک بۆ بیرویادی پەروەردگار؛ چونکە مەزنترین عیبادەت، ڕامان و وردەوبوونە لە دەسکردەکانی خودا، لە مەلەکووتی زەوی و ئاسمان، لە ناسینی نهێنیەکانی پەروەردگار، لە ڕۆژی پەسلان و دونیا؛ تەنانەت چاتر وایە سەرجەمی بیروهۆشی بۆ یادی بینایی چاوان تەرخان کا، تا نە تەنیا لە خەلکوخوا، بەلکوو لە خۆشی ئاگای ببڕێ و بێجگە لە خوا هیچ نەمێنێ. ئەمەش بێجگە لە دابڕان لە خەلکی و خۆ لە سووچێ پەستاوتن، بە هیچ کاریتر بۆی پێک نایە؛ چونکە خەلکی پەرژاونەتە سەر بێجگە لە خوا، بە تایبەت ئەوەی نەگەیشتۆتە ئاستێ کە لە نێو خەلکدا لە گەڵ خوا بێ، وەکوو پێغەمبەران . لەم سۆنگەوە کە پێغەمبەر لە سەرەتای بوونە پێغەمبەریدا لە خەلکی دووری دەگرت و لە تەنیایی ئەشکەفتی حەرادا دەمایەوە، تا ئەوەی لە پێغەمبەریدا گەشایەوە و دڵ و دەروونی بووژایەوە و گەیشتە ئاستێ کە بە لەش لەگەڵ خەڵک بوو و بەدڵ لەگەڵ خوا. بۆیە فەرمووی: «ئەگەر کەسێکم لە بۆ دۆستی خۆم هەڵبژاردایە، ئەبووبەکرم هەڵدەبژارد. بەڵام دۆستی دەگەڵ پەروەرندەم جێی بۆ کەسیتر نەهێشتۆتەوە». کەچی خەلکی لایان وابوو کە پێغەمبەر لەگەڵ هەموو کەسێ دۆستە. سەیریش نییە ئەگەر چاکان بگەن بە ئاوەها ئاستێ و پاگەیەک. سەهلی توستەری دەیگوت: «پتر لە سی ساڵانە دەگەڵ خودانم دەدوێم و خەلکوخوا لایان وایە دەگەڵ ئەوان دەپەیڤم». زۆری وا هەیە گڕی ئەڤینی مرۆیەکیتری بەر بووبێتە گیان و لە نێو خەڵکدا بێ، کەچی نە دەنگی کەس ببیسێ و نە ڕەنگی کەس ببینێ.

یەکێک بە خواناسێکی گوت: «بە ڕاستی کە پشوودرێژی لە تەنیاییدا!» گوتی: «من تەنیا نیم، هاونشینی پەروەرندەمم: کە بمەوێ دەگەڵی بدوێم، نوێژێ دەکەم، کە بمەوێ دەگەڵم قسە بکا،

قورعانێ دەخوێنم».

لە یەکێکیان پرسی: «ئەم تاقمە چ قازانجێکیان لە تەنیایی بەر کەوتووە؟» گوتی: «هۆگربوون لەگەڵ پەروەردگار».

بە حەسەنی بەسرییان گوت: «پیاوێک لێرەیە کە هەموو دەم بە تاقی تەنێ لە لای ئەو کۆڵەکەدا دادەنیشێ». گوتی: «کە هاتەوە پێم بڵێن». کە هاتەوە، ئاگاداریان کردەوە. رۆیشتە لای و پێی گوت: «هەموو کات تەنیای، بۆ تێکەڵی خەڵکی نابی؟» گوتی: «کارێکم بۆ هاتۆتە دی، کە پێم ناکرێ ئاوڕ لە چیدی بدەمەوە». گوتی: «بۆچی ناڕۆیتە لای حەسەن تا گوێ لە پەیڤی بگری؟» گوتی: «ئەم کارە لە حەسەن و خەڵکیتری بێنیازی کردووم». گوتی: «ئەو کارە چییە؟» گوتی: «دلۆڤانی و خێری پەروەرندەم بۆ من و گوناح و تاوانی من بۆ ئەو بەردەوامە؛ بویە سوپاسی چاکەکانی دەکەم و لە گوناحەکانم پاشگەز دەبمەوە؛ نە پێم دەکرێ گوێ لە حەسەن بگرم، نە بپەرژێمە سەر خەڵکی». گوتی:« لەسەر جێی خۆت بمێنەوە؛ بە راستی تۆ گەلێک لە حەسەن زاناترو هێژاتری».

«هرم بن حیان» رۆیشتە لای وەیسی قەرەنی. وەیس پێی گوت:«چۆن هاتی؟» گوتی: «هاتم تا لەلای تۆ بحەسێمەوە». وەیس گوتی: «قەد نەمدەزانی کەسی واش هەیە کە پەروەرندەی خۆی بناسێ و لەلای کەسیتر بحاوێتەوە».

فوزەیل گوتی: «کە تاریکی شەو داهات، هەتاوی شادی لە دلمدا هەڵدێ، دەڵێم تا بەیانی بە تەنیا لەگەڵ پەروەرندەم دادەنیشم. کە رووناکی رۆژ هەڵات، خەم و کەسەر دامدەگرێ، چونکە دەڵێم خەڵکی دەبنە لەمپەرێ لە هەمبەر خۆم وخودام».

مالکی دینار دەڵێ: «ئەوەی ئاخافتن لەگەڵ خودانی پێ خۆشتر نەبێ تا پەیڤین لەگەڵ خەلکوخوا، زانستی کەل و کوتەرەو دڵی کوێر و نابینایە و تەمەنی بەفێڕۆ چووە».

زانایەک دەڵێ: «هەرکەس بە ئارەزوو بێ کەسێک ببینێ و لەگەڵی دانیشێ، لە کەمایەسی ئەو کەسەیە؛ چونکە دڵی تەژی لەو شتەی کە پێویستیە، کەچی ئەو لە دەرەوە بۆی هەڵوەدایە». گوتوویانە: «هەرکەس هۆگری خەلکوخوا بێ، لە ریزی هیچ نەدارانە».

کەواتە، هەرکەس پێی کرا بەردەوام بیر و یادی خودا کا، یا خۆ بە زۆربیرکردنەوە، جوانی و گەورەیی پەروەردگاری لێ خویان بوو، ئەوە لە هەموو عیبادەتێ هێژاترە؛ چونکە لە راستیدا ئەوپەڕی بەختەوەری ئەوەیە کاتێ کە کەسێک بەرەو جیهانی هەرەمانەوە کۆچ دەکا، خۆشەویستی پەروەرندەی بەسەر دڵدا تەیار بووبێ. خۆشەویستی بە بیرویادکردنەوە پێک دێ؛ خۆشەویستی و هۆگربوون بەری زانینە و زانین بەری بیرکردنەوەو هەموو ئەمانەش بە دابڕان لەخەلک پێک دێن.

**بەهرەی دووەم** — بە هۆی دووری لە خەلکوخوا، لەزۆر گوناح و هەڵە دەرباز دەبێ. چوار گوناح

هەیە کە لە تێکەڵ بوون دەگەڵ خەڵکی تووشیاری دەبێ:

**گوناحی یەکەم** - بیستن یا خۆ گوتنی خوسپە و پاشملە؛ ئەمەش دین بە فەوتان دەدا.

**گوناحی دووەم** – فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە؛ چونکە ئەگەر خۆ بێدەنگ کاو لە هەڵەی خەڵکی گوێی خۆی کەڕ کا، گوناحبار دەبێ وئەگەریش بیڵێ بەزۆری تووشی دەردی سەر دەبێ.

**گوناحی سێهەم** - مەرایی و دووڕوویی؛ لەتێکەڵاوی دەگەڵ خەڵکی تووشیاری دەبێ: چونکە گەر لەگەڵ خەڵکی نەساچێ، دەیڕەنجێنن؛ گەریش ساچیا، تووشی دووڕوویی دێ؛ چونکە بە راستی لێک هەڵاواردنی دوڕوویی و سازگاری ئێجگار ئەستەمە؛ ئەگەر لەگەڵ دوو دوژمن قسەی کردو دەگەڵ هەردوویان هاودەنگی کرد، دوڕوویيە و گەر نەیکرد بە دوژمنایەتیان تووشیار دێ. لانی کەم ئەوەیە کە کاتێ دەیبینن، پێی دەڵێن «پاپای دیدارت بووین» -زۆر جار ئەم پەیڤەیان درۆیە- ئەگەر ئەمیش وەک خۆیان نەڵێ، لێی زویر دەبن، گەریش بڵێ منیش هەروا تامازرۆی دیتنت بووم، تووشی درۆ و دوڕوویی بووە؛ لەوەش کەمتر ئەوەیە کە ناسیاوێکی دەبینێ و لێی دەپرسێ کە «خۆت و بنەماڵەت چۆنن؟» و لە دڵەوە خەمی ئەوانی نییە، ئەمەش بە تەواوی دوڕوويیە.

ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «کەسی وا هەیە کە بە نیازی کارێ لەماڵ دێتە دەرێ و دەڕواتە لای کەسێ. ئەوەندە بەو کەسەدا هەڵدەڵێ و پەسنی دەکا -هەر بە درۆ- کەدینی خۆی لەسەر دادەنێ و کاتی گەڕانەوە، کاری خۆی پێک هێناوەو پەروەردگاری لەخۆ تووڕە کردووە».

«سرّی سقطی» گوتی: «ئەگەر برادەرێکم بێتە لام و منیش دەس بە ڕدێنمدا بێنم تا ڕێکوپێک بێ، زۆر دەترسم ناوم بخرێتە ریزی ناوی دوڕازانەوە».

فوزەیل بە تەنیا دانیشتبوو، یەکێک هاتە لای. گوتی: «بۆچی هاتی؟» گوتی: «بۆ سەردان و دۆستایەتیت». گوتی: «سوێند بەخودا ئەم سەردانەت لە گوناحباری نزدیکترە. تۆ هاتی بۆ لام تا بە درۆ چاکەم لەگەڵ کەی و منیش هەروا، تۆ درۆیەک بە من بڵێی و منیش بە تۆ؛ کە وایە یا بگەڕێوە، یا بۆ خۆم دەڕۆم». بەڵام ئەوەی پێی بکرێ لەم پەیڤانە خۆ ببوێرێ، باشتر لەگەڵ خەڵکی تێکەڵ بێ.

پێشوونان کاتێ یەکیان دەبینی، لە دونیای یەک نەیاندەپرسی، بەڵکوو لە دینی یەکیان دەپرسی. حاتەمی ئەسەم بە حامیدی لەففافی گوت: «چۆنی؟» گوتی: «ساغ و سەلامەتم». حاتەم گوتی: «ساغی پاش برینی ڕێگایە و سەلامەت پاش چوونە نێو بەهەشتە».

کاتێ بەعیسایان گوت: «چۆنی؟» گوتی: «ئەوەی قازانجی منی تێدایە، نییە لە دەستی منداو ئەوەش زیانی منی پێیە، بەرگری پێم ناکرێ. من گیرۆدەی کاری خۆمم و کەچی کارم لە دەستی کەسیتردایە؛ کەواتە، هیچ هەژارێک هەژارتر و نەدارتر لە من نییە».

کاتێ بە «رەبیعی خەیسەم» دەیانگوت: «چۆنی؟» دەیگوت: «هێزبڕاو و گوناحبارم و مەرگیش

بۆسەی لێ گرتووم؛ ڕۆژی خۆم دەخۆم و چاوم لە بەزیی پەروەرندەمە». بە ئەبوودەردایان گوت چۆنی؟ گوتی: «دەبێ چۆن بێ ئەو کەسەی کە بەیانی رادەبێ، نازانێ تا شەو دەژی یا نە، کە شەو سەردەنێتە سەرسەرین، نازانێ بەیانی رادەبێ یان نە». مالکی دینار لە پەرسڤی ئەوانەی گوتیان چۆنی، گوتی: «دەبێ چۆن بێ ئەو کەسەی تەمەنی کورتە و گوناحی زۆر؟» زانایەک لە وەرامی ئەوانەی گوتیان چۆنی، گوتی: «لە سەر خوانی خودام و گوێڕایەڵی شەیتانم». بە محەممەدی کوڕی واسعیان گوت «چۆنی؟» گوتی: «دەبێ چۆن بێ ئەو کەسەی هەر ڕۆژ هەنگاوێ لە دواڕۆژ نزیک دەبێ؟» بەحامیدی لەففافیان گوت چۆنی، گوتی: «ئامازرۆی تەنیا ڕۆژێک سەلامەتیم» گوتیان: «نەخۆشی؟» گوتی: «سەلامەتی ئەو ڕۆژەیە کە تووشیاری گوناح نەبم». لە سەرەمەرگدا بە یەکێکیان گوت چۆنی، گوتی: «دەبێ چۆن بێ حالی ئەو کەسەی بە بێ توێشوو لە سەفەرێکی دوورودرێژایە، بەبێ هاودەم لە گۆڕێکی تەنگەبەردایەو بە بێبەڵگەو کاری چاکە لە پەرای خونکارێکی دادگەردایە». حەسسان کوڕی ئەبی سەنان کاتێ گوتیان چۆنی، گوتی: «چۆنە ئەو کەسەی دڵنیایە دەمرێ و بۆ پرسینەوە هەڵیدەسێننەوە؟»

ئیبنیسیرین بە یەکێکی گوت چۆنی، گوتی: «چۆنە حالی کەسێک کە پێنجسەد درهەم قەرزدارەو خێزانبارەو هیچی نییە؟» ئیبنی سیرین گەڕایەوە مالی خۆی، هەزار درهەمی هێناو پێی داو گوتی: «پێنجسەدی بدەرەوە بەخاوەن قەرزو پێنجسەدی بۆ بژیوی ژن و منداڵت، بەڵێنیش بێ بە کەس نەڵێم؛ ئێستا چۆنی؟» بۆیە وای کرد، چونکە لێی پرسی چۆنی و گەر چاری دەردی نەکردایە، بە دوڕوو دەژمێردرا.

گەورەکان دەڵێن: «کەسانێکمان دەبینی کە سڵاوی یەکیان نەدەکرد، کەچی ئەگەر یەکیان داوای دارونەداری یەکێکیتریانی کردایە، هەرچی هەبوایە، پێی دەدا. کەچی ئێستا خەڵکی وا سڵاوی یەکتر دەکەن، تەنانەت لە مریشکی بەردەرکەشیان دەپرسنەوە، کەچی ئەگەر یەکیان داوای دراوێ لە یەکیان کا، قەد نایداتێ؛ ئەمەش تەنیا بە بۆنەی دوڕووبوونە و بەس». کەواتە چونکە خەڵکی وایان لێهاتووە، هەرکەس دەگەڵیان تێکەڵ بێ، ئەگەر سەربۆ پەیڤ و کردەیان بلەقنێ، لە درۆ و دوڕووییاندا بەشدارە، گەریش بە پێچەوانەیان بئاژوێ و بدوێ، بە دوژمنی دەزانن و بە ڕەزاگرانیان دێتە پێش چاو و هەموویان بۆ خوسپەی بەردەبنە گیانی و دینی ئەم بە هۆی ئەوان دەفەوتێ و دینی ئەوانیش لە سۆنگەی ئەمەوە دەفەوتێ.

**گوناحی چوارەم:** پێوەندی دەگەڵ خەلک وایە، کە گەر لەگەڵ کەسێک دابنیشی، بە بێ ئەوەی خۆت بزانی، دانستەکانی لە سەرت کاریگەر دەبن. ئەمەش خۆی تووی زۆر گوناحت بۆ دەپژێنێ. هەرکەس لەگەڵ دونیا دۆستان تێکەڵ بێ وحەزیان بۆ دونیا ببینێ، ئەویش ئارەزووی دونیای لە دڵ

پێک دێ. هەروەها هەرکەس زۆر لەگەڵ داوێنتەڕان تێکەڵ بوو -هەرچەند بە خراپیشان بزانێ- گوناحی لەبەر چاو ئاسان دەبێ؛ هەر گوناحێکیش کە بە زۆری ببینرێ، دزێویەکەی لەدڵ دەڕەوێ و بۆی بەدەو دەبێ؛ بەم بۆنەیە کە گەر زانایەک بە بەرگی ئاوریشمەوە ببینن، زۆر لۆمەی دەکەن وبگرە هەمووی ئەو ڕۆژە لە پاشمای بخوێنن و لۆمەی کارەکەی بکەن، کەچی خوسپە لە ئاوریشم دەبەرکردن زۆر ناحەزترە، تەنانەت لە زیناش خراپترە؛ بەڵام چونکە زۆر دەبێژرێ، ناحەزیەکەی نەماوەو لەبەر چاوان خەملێنراوە. بیستنی حالی بێخەبەران و لاڕێیان، زیانی هەیە، هەر وەکوو چۆن گوێ گرتن لە سەربهوردی پێغەمبەر ویارانی پاداشی هەیە؛ تەنانەت کاتی باسی پیاو چاکان، لە ئاسمانڕا ڕەحمەت دادەبارێ، هەروەک لە خەبەردا بێژراوە «عِندَ ذِکْرِ الصّالحینَ تَنَزّلُ الرّحمة». هۆکەشی ئەوەیە کە لەدڵدا پاپای کاری خێر پێک دێ و حەزی دونیا کەم دەبێ. هەروەها لە کاتی گێڕانەوەی کردەوەی لاڕێیاندا، لەئاسمانڕا تووک و نزا دادەبارێ، چونکە گوتنی ئەم پەیڤانە گرۆی دونیا دەخاتە دڵ. باس لەم کەسانە دەبێتە هۆی نوقسانی دین، کەوابوو دیداریان زۆر خراپترە. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «دۆستی خراپ، وەکوو ئاسنگەر وایە: گەر جلکت لە لای نەسووتێ، دووکەڵت تێ دەگرێ؛ هاونشینی خاسیش وەکوو عەترفرۆش وایە: گەر میسکیشت نەداتێ، جلوبەرگت بۆن خۆش دەبێ». کەواتە دەبێ بزانی تەنیایی چاتر لە هاوڕازی خراپەو هەواڵی چاکیش هێژاترە لە تەنیایی. پێوەندی لەگەڵ کەسێ کە حەزی دونیات لە دڵ دەرکا و هۆگری دواڕۆژت پتر کا، بە خێرو ودمە؛ زۆری لە گەڵ بە. ئەوەش ئاوەژووی ئەوە بوو، لێی دوور بگرەو توخنی مەکەوە؛ بەدانستە، زانایەک کە گراوی دونیا بێ و گفت و لفتی وەک یەک نەبێ. ئاوەها کەسێک ژاری کوشندەیە و ئاوڕووی موسوڵمانی بەرە، چونکە بە خۆ دەڵێی «ئەگەر موسوڵمانی ڕاست بایە، لەسەر ئەم کابرا پێویستتر بوو». ئەمە چیرۆکی ئەو کابرایەیە کە تەوەقی هەڵوای لە کۆش نابێ و بە هەڵپەهەڵپ لێی بخواو هاوار کا «هۆ خەڵکینە! لەم هەڵوایە نەخۆن ژاری کوشندەی لێیە». کەس باوەڕی پێ نەکاو ئەو خواردنەی بەڵگەیە بۆ ژاراوی نەبوونی ئەو هەڵوایە. زۆرن ئەو کەسانەی کە هیچ ڕموودەی خراپە نین، بەڵام بە بیستن و دیتنی ئەو زانایانەی کە خراپە دەکەن، هۆگری ئاکاری نزم دەبن. خوسپەو پاشملە گوتنی زانا لە دووسۆنگەوە حەرامە: یەکەم خوسپەیە؛ دووهەم خەڵکی چاوی لێ دەبڕن و شەیتان دنەیان دەداو دەڵێ «خۆ تۆ لەفلان زانا گەورەترو پارێزکارتر نیت و نابی».

خەڵکی ڕەمەکی دەبێ کاتێ هەڵەیەکیان لەزانایەک بینی، دوو شتیان لەبەرچاو بێ: **یەکەم** ئەوەی کە ئەگەر زانایەک هەڵەیەکی کرد، ڕەنگە زانستەکەی ببێتە کەفارەی گوناحەکەی، چونکە زانست تکاکارێکی بە زەبرەو خەڵکی ڕەمەکی لەو تکاکارە بێبەشن؛ **دووەم** ئەوەی کە زانینی ئەوەی کە «خواردنی ماڵی نارەوا، نالەبارە» وەکوو ئەوەیە کە خەڵکی ڕەمەکی دەزانن کە «خواردنی مەی و زینا

کردن حەرامە» و هەرکەس بە قەدەر زانینی ئەمەی کە خواردنی مەی و زینا حەرامە، زانایە و ئەم ڕادەش لەزانایی، نابێتە بەڵگە بۆ هان نەدانی کەسێک بۆ گوناح نەکردن؛ خواردنی ماڵی حەرامیش ئاوەهایە.

زۆربەی ئەوانەی لەسەر حەرام پێدادەگرن، کەسانێکن کە بە ڕواڵەت زانان، کەچی لە کاکڵەو ناوەرۆکی دین هیچ تێنەگەیشتوون و بیانوو و شرۆڤەیەک بۆ کردەوەیان دەبیننەوەو خەڵکیش لێی ناگەن. خەڵکی ڕەمەکی نابێ بە چاوبڕین لەم کەسانە دواڕۆژی خۆیان بفەوتێنن.

مەبەست ئەوەیە کەرۆژگار وای لێهاتووە کە دەبێ لە زۆربەی خەڵکی خۆ بپارێزی؛ چیرۆکی مووسا و خزر کە گەمیەکەی کون کرد، لەم سۆنگەوە لە قورئاندا باسی کراوە. مەبەست ئەوەیە کەپێوەندی لەگەڵ زۆربەی خەڵک زیانی هەیە؛ کەواتە، دوورەپەرێزی و لە خەڵک دابڕان هێژاترە.

**بەهرەی سێیەم**- هیچ شار و بازێڕێ لە شەڕ و ئاژاوە خاڵی نییە، مەگین ئەوەی خوا بیەوێ؛ بەم بۆنەوە هەرکەس خۆی لە کونجێ پەستاوت، لە شەڕ خۆی پاراست و کە تێکەڵیان بوو تووشی ئاژاوە دەبێ و دینی بە خەسار دەدا.

عەبدوڵلای مەسعوود لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە: «ڕۆژێ دادێ کە کەس دینی بێوەی نابێ، مەگەر ئەو کەسانەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنیتر، لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر لەکونجێکەوە بۆ کونجێکیتر هەڵدێن و وەکوو ڕێوی خۆیان لەخۆیان دەدزنەوە». پرسیان: «ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە کەنگێیە؟ » فەرمووی: «کاتێ کە بەبێ تووش بوون بە گوناح، ژین بەڕێوە نەڕوا، ئەو کاتە بەزگوردی ژیان، ڕەوایە». پرسیان: «ئەی پێغەمبەر! تۆ کە ڕاتسپاردین بۆ ژن هێنان، چۆن وادەفەرمووی؟» فەرمووی: «ئەو کاتە پیاو بە هۆی دایک و بابیەوە دەفەوتێ، گەر مردبێتن بەهۆی ژن و منداڵیەوە، گەر ئەوانەشی نەبوو، بە هۆی خزم و کرێڤانیەوە».

گوتیان: «بۆچی؟» فەرمووی: «بە هۆی هەژاری و نەداریەوە لۆمەی دەکەن و بۆ ئەو کارەی کە پێی ناخۆشە دنەی دەدەن و دین و دواڕۆژی دەفەوتێنن». ئەم پەیڤە هەرچەن بۆ ژیانی ڕەبەنانەیە، بەڵام دوورەپەرێزیش دەگرێتەوە.

سەفیانی سەوری لە ڕۆژگاری خۆیدا دەیگوت: «وَاللهِ لَقَدْ حَلَّتِ العُزوبَة»؛ واتە، سوێند بەخودا کە زگوردی حەڵاڵ بووە.

**بەهرەی چوارەم** - لە ئازار ونەهامەتی خەڵکی رزگار دەبێ، چونکە تا لە نێوان خەڵکیدا بێ، لە ئازار و خوسپە و دڕدۆنگی و خەیاڵی خاو دەرباز نابێ، کاتێ کردەیەکی لێ ببینن کە ئاوەزیان پێی ڕانەگا، تانە و تەشەری لێ دەدەن؛ ئەگەر بیەوێ هەموو ئەرکی لە ئاست خەڵکی بە جێ بێنێ -لەسەردان و سەرەخۆشی و میوانی- هەموو ژینی پێوە دەڕواو بەهیچ کاری خۆی ڕاناگا؛ ئەگەر بۆ لای هەندێ بڕوا

و واز لەکەسانیتر بێنێ، لێی زویر دەبن و لە ئازاری خۆنابوێرن؛ بەڵام کە لە هەموویان دابڕاو لەسووچێکدا گرسایەوە، لە نووکوبەدیان رزگار دەبێ.

یەکێک لە گەورەکان، لە گۆڕستان و کتێب دوور نەدەکەوتەوە و خۆی لەخەڵکی دابڕابوو. پێیان گوت: «بۆچ وادەکەی؟» گوتی: «هیچ کوێم بێوەیتر لە تەنیایی نەدیەوە، هیچ ئامۆژیارم چاتر لە سەرقەبران نەدی و هیچ هاوڕازم باشتر لە کتێب نەدی».

سابتی بەنانی -یەکێک لەدۆستانی خودا بوو- بۆ حەسەنی بەسری نووسی: «بیستم کەبۆ حەج دەڕۆی، پێم خۆش بوو ببمە هاوسەفەرت». حەسەن گوتی: «با هەر دووومان لە پەنای پەروەرندەمان بژین، چونکە رەنگە شتێکمان لێ بوەشێتەوە و ببین بەدوژمنی یەک». ئەمەش یەکێک لە قازانجەکانی دوورەپەرێزییە تاکوو پەردەی مێرخاسی نەدرێ و دەروون وەدەرنەکەوێ و شتی چاوەڕوان نەکراو خویان نەبێ.

**بەهرەی پێنجەم** – نە خەڵکوخوا تەمای تێدەکەن، نە تەما لە خەڵکی دەکا؛ لەم دوو ئارەزووەش هەڵەو گوناحی زۆر دێتە دی؛ چونکە هەرکەس هۆگرانی دونیا ببینێ، ئارەزووی دەبزوێتەوەو تەماش پاشەڕۆکی ئارەزووەو چرووکی پاشەڕۆکی تەما. بۆیە پەروەردگار فەرمووی: وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا[1].

پێغەمبەر فەرمووی:« سەیری ئەو ژینە لەبارەیان مەکە، چونکە ئەوە هۆی ئاژاوەی دواڕۆژیانە». دیسان فەرمووی: «لە دونیادا سەیری سەرتر لەخۆتان مەکەن؛ چونکە ئەو دلۆڤانیەی خوداتان لە لا بێنرخ دەبێ»؛ ئەوەی سەیری سەروسامانی ساماندااران کا، ئەگەر بکەوێتە تەک و دووی بە دەست هێنانی دونیا، هەم پێی ناگاو هەم دواڕۆژی دەدۆڕێنێ، ئەگەریش نەکەوێتە دووی، ناچارە چاری خۆی بە پشوودێژی کاو ئەمە گەلێک دژوارە.

**بەهرەی شەشەم** - هەرکەس لە خەڵک دووری گرت، لە دیداری خەڵکی رەزاگران و نەفام رزگار دەبێ.

بە ئەعمەشیان گوت: «بۆچی چاوت لە دەس دا؟» گوتی: «ئەوەندە رەزاتاڵم پێ بینی». جالینووس گوتی: «گیانیش وەکوو لەش یاو دەیگرێ، تای گیان دیدای رەزاگرانانە». شافعی گوتی: «هەرکات لەگەڵ رەزاگرانێ دەئاخاوتم، ئەو باسەی کە لە سەری دەدواین گرانتر دەبوو».

هەرچەند ئەم بەهرەیە هی دونیایە، بەڵام دینیشی پێوە بەندیوارە؛ چونکە کە دیداری کەسێکی پێ

---

١ - (قورعان؛ ١٣١/٢٠) چاوت مەدە سەر ئەوشتەی کە داومانە بە دەستەگەلێ لەوانە؛ کە ئەمە هەر خۆشی ژیانی دنیایە و هەر ویستوومانە بیانئەزمووین و بژیوی پەروەرندەی تۆ چاتر و بەردەوامترە. (هـ).

گران بوو، بەدڵ یا بە زمان خوسپەی دەکا. بەڵام کە تەنیا بوو لەمەش رزگار دەبێ.

## زیانەکانی دوورە پەرێزی

گەلێک بابەتی دینی و دونیایی تەنیا بە پێوەندی لەگەڵ خەڵکی پێک دێ و بەدابڕان لە خەڵکی ئەو بابەتانەش دەفەوتن و فەوتانی ئەوانەش، لە زیانەکانی دوورەپەرێزین و ئەوانەش شەشن:

**زیانی یەکەم** - بەجێمان لەفێربوونی زانست. هەرکەس ئەو زانستەی لە سەری فەرزە فێر نەبووبێ، دوورەپەرێزی لە سەری حەرامە؛ بەڵام بۆی هەیە ئەگەر ئەو زانستانەی لە سەری فەرزن فێر بوو، بە وردی لێی شارەزابوو، بەڵام فێربوونی زانستیتری پێ گران بوو و لێی تێنەدەگەیشت، لە خەڵک دابڕێ بۆ عیبادەت کردن؛ ئەگەر پێی بکرێ زانستی دین بەتەکووزی فێر بێ و رابێ و بۆ خۆی نەپەرژێتە سەری، زیانێکی ئێجگار گەورەی تووش هاتووە؛ چونکە هەرکەس بەر لەراهاتن لە خەڵک دابڕێ، زۆربەی کاتی بەخەیاڵی پڕوپووچ دەفەوتێنێ؛ هەروەها ئەگەر هەموو رۆژ و شەوی بەعیبادەت بەرێتە سەر، چونکە بینای زانستی لەدڵی خوی بنات نەناوە، رەنگە لەعیبادەتدا تووشی لووتبەرزی و گزی بێ و بڕوای لە بیری چەوت و هەڵە دوور نەبێ و ئەو بیرانەی بە بیریدا تێدەپەڕن لە مەڕ پەروەردگار، رەنگە گوناح بن و تووشی لاڕێی کەن و بە خۆی نەزانێ.

بە گشتی لە خەڵک دابڕان بۆ زانایان دەبێ، نەک خەڵکی ئاسایی؛ چونکە خەڵکی ئاسایی کە نەخۆش بن، نابێ لەبەر پزیشک هەڵبێن و بنە تەبیبی خۆیان و خۆ بەکوشتن دەن. بەڵام فێرکردن ئاستێکی زۆر بەرزە. عیسا دەڵێ: «هەرکەس زانستێ بزانێ و خەڵکی پێ فێر کا، لە مەلەکووتی ئاسماندا بەهێژایی ناوی دەبەن». فێرکارییش لەگەڵ دوورەپەرێزی ناگونجێ و هەروەها فێرکاری هێژاترو سەرتر لە دوورەپەرێزییە، بەومەرجەی مەبەستی خۆی و شاگردی فێربوونی دین بێ، نەک بە دەسهێنانی پلەو پاگەی دونیایی. دەبێ زانستێ فێر کا کە خێر و قازانجی دینی تێدا بێ. بۆ وێنە کاتێ لە تارەتەوە باسی دەس پێکرد، دەبێ بڵێ تارەتی بەرگ ولەش زۆر کەم بایەخە و مەبەست لەتارەت، شتێکە بێجگە لەمەو ئەوەش پاکی چاو و گوێ و زمان و دەست و پێ و ئەندامانیترە لە تووشبوون بە گوناح وتاوان. ئەمەش بە وردی پێی بڵێ تا بە پێی ئەوە ببزوێتەوە؛ ئەگەر بە گوێی نەکرد و بۆ فێربوونی زانستێکیتر هانیدا، دیارە مەبەستی دونیایە، نەک دین. کە لەم پەیڤەش بووەوە، پێی بڵێ مەبەست لەم تارەتە، پاکژکردنی دڵە لە دۆستی دونیا و لە هەرچی بێجگە خوایە؛ راستەقینەی لاالەالاالله ئەوەیە کە هیچ پەروەرندەیەک نییە، بێجگە لە خوا؛ ئەوەش لە بەندی ئارەزووی نەفسە (فَقَد اتَّخَذ الهَهُ هَوِيهُ) ئارەزووی خۆی کردۆتە خوداو لەراستەقینەی بڕوا بێبەش ماوە.

چونکە رزگاربوون لە ئارەزووی نەفسی بۆ خویان نابێ، مەگین ئەوەی کە ئەو شتانەی لە بەشی

«منجیات» و «مهلکات»دا بێژراون، بەوردی بخوێنێتەوە و ئەمەش فەرزی عەینە بەسەر هەموو خەڵکیدا. کە خوێنکار بەر لە دوایی هێنان بەم زانستانە بیەوێ لە حوکمی نەخۆشی ژنان و تەلاق و پیتاک و فتوای دژایەتی بگا، یا خۆ زانستی شەڕەقسەو پەیڤین و سەفسەتە لەگەڵ موعتەزیلە یان کەڕرامیان فێر بێ، ئاشکرایە کە کەڵکەڵەی ماڵی دونیایە نەک دین؛ دەبێ لەم کەسە دوور بی، چونکە مەکۆی شەڕ و ئاژاوەیە؛ یا خۆ گەر نەیویست لەگەڵ شەیتان و ئارەزووی نەفسی -کە دوژمنانی سوێند خواردووین و بۆسەیان لێ گرتووە- بەشەڕ بێ و دایانسەکێنێ، کەچی بۆ شەڕەقسە تامازرۆیە فێربوونی پەیڤ و رای ئەبووحەنیفە و شافیعی و موعتەزیلە کەوتۆتە گیانی، ئاشکرایە شەیتان لەئەستۆی سوار بووەو هەوساری لەدەست گرتووەو کردوویە بە گەپچاڕی خۆی و ئەو ئاکارە نزمانەی -کە لە دڵیدا کۆمەیان بەستووە- وەکی رژدی و چاوچنۆکی و دەمارزلی و خۆزلزانی و گراوی دونیا. هەمووی ئەمانەش کوشندەی دڵ و بزوێنەری ئارەزووی نەفسن؛ کە فێرکار دڵی خۆی لێ پاکژ نەکاو بپەرژێتە سەرئەمەی کە لە باسی ژنهێنان و تەلاقدان و سەلەم و کرێ و... رای کام زانا راست و دروستترە. دەبێ لەو کەسەش پارێزبکرێ.

رۆژگار وای لێ هاتووە کە لە شارێکی زۆر گەورەشدا پتر لە یەک دووکەس کە شیاوی شاگردی بن، دەست ناکەون. بۆیە دوورەپەرێزیش بۆ مامۆستایان چاترە؛ چونکە هەرکەس زانست بە کەسێک فێر کا کە پاپای دونیای لە دڵدا پەپکە بەستبێ، وەکوو ئەوەیە کە شیر بە رێگر بفرۆشێ؛ ئەگەر بڵێ «رەنگە رۆژێ بۆ سەر رێی دین بگەڕێتەوە» وەکوو ئەوەیە کە بڵێ رەنگە ئەم جەردەیە رۆژێ لە گوناحی پاشگەز بێ و شیری لە خەزادا بگێڕێ. یا خۆ بڵێ «شیر کەس بەرەو لای پەروەردگار ناگێڕێتەوە، بەڵام زانست بۆی هەیە»، ئەمەش تەواو هەڵەیە؛ چونکەزانستی فتوا و شەڕەقسە و مامەڵە و رێزمان و کەلام، کەس بەرەو پەروەردگار ناگێڕنەوە؛ چونکە لەم زانستانەدا دوور کردنەوە لە خراپە و هان دان بەرەو رێی خودا جێگایەکی نییە، بەڵکوو هەر یەکەیان بە جیاواز تووی رژدی و چاوچنۆکی و بەخیلی و خۆبەزلزانی و دەماربەرزی دەچێننە دڵ و رایدێنن؛ «وَلَيْسَ الْخَبَرُ كَالْمُعَايَنَةِ»[1]؛ بڕوانە ئەوانەی خەریکی ئەم زانستە بوون، چۆن ژیان و چۆن مردن.

ئەو زانستەی کە خەڵکی بەرەو رۆژی پەسڵان بانگهێشتن دەکاو لە دونیایان دەگێڕێتەوە، تەنیا زانستی حەدیس و شرۆڤەی قورعانە و ئەم زانستانەیە کە لە بەشی «مهلکات» و «منجیات»دا بێژراون. ئەم زانستانە لە هەموو دڵێکدا رۆدەچن و کاریگەر دەبن، مەگین ئەو دڵەی لەبەر گوناح رەش داهاتبێ و وەکوو بەرد، سەخت هەڵگەڕابێ. کەواتە دوورگرتن و دابڕان لە کەسێک کە ئەم

---

١ - بیستن کەی دەبێتە وەک دیتن.

ڕستانەی بوێ و تامازرۆیان بێ، لە گوناحگەلی گەورەیە.

ئەگەر کەسێک زانستی حەدیس وشرۆڤە و ئەوەی گرینگە فێر بێ، کەچی ئارەزووی دونیای لە دڵ نەڕەوێ، چاتر وایە لە فێرکاری خوببوێرێ، هەرچەن کە کەسانیتر لەزانستەکانی بەهرەمەند دەبن؛ بەڵام بەم کارەی دینی خۆی دەفەوتێنێ؛ خۆی بەخت دەکا بۆ کەسانیتر. بەم بۆنەوە بوو پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەردگار دینی خۆی سەردەخا بە هۆی کەسانێکەوە کە خۆیان هیچ لەدین بەش نابەن». ئەمانە وەکی مۆمن، کە خۆی دەسووتێ و دەتوێتەوەو خاسی روون دەکاتەوە، کەچی خۆی بەردەوام کورتتر دەبێتەوە.

لەم سۆنگەوە بوو کە بێشری حافی حەوت سندۆق کتێبی حەدیسی خوێند و هەمووی چاڵ کرد و بۆ خۆشی نەیدەگوتەوەو دەیگوت: «بۆیە نایڵێمەوە چونکە ئارەزووی پەیڤین لەدڵمدایە، هەرکات ئەم ئارەزووەم لەدڵ رەوی، ئەم حەدیسانەش دەڵێمەوە». گەورەکان گوتوویانە: «حَدَّثنا»[1] دەرگایەکە بەرەو دونیا؛ هەرکەس گوتی «حَدَّثنا» مەبەستی ئەوەیە کە لە لای سەروو دامنێن. عەلی لە شوێنێکدا ڕابورد، یەکێک لەسەر مینبەر خەریکی ئاخافتن بوو، گوتی: «ئەم کابرایە دەڵێ "اعرفونی"؛ واتە بمناسن».

یەکێک لە عومەر ئیزنی خواست تا بەیانان پاش نوێژی بەیانی، ئامۆژگاری بۆ خەڵکی کا. ئیزنی نەدا. کابرا گوتی: «لە مۆچیاریکردن بەرگری دەکەی؟» گوتی: «ئەرێ. دەترسم ئەوەندە خۆت بە زل بزانی، لووتت بە ئاسمانەوە بنووسێ».

رابیعەی عەدوییە بە سەفیانی سەوری گوت: «گەلێک مێرخاس بووی، ئەگەر گراوی دونیا نەبوویتایە». گوتی: «چۆن؟» گوتی: «گوتنەوەی حەدیست زۆر پێ خۆشە». ئەبووسلەیمانی خەتتابی دەڵێ: «ئەوانەی لەم رۆژگارەدا دۆستایەتیتیان پێ خۆشەو دەڵێن حەز دەکەن زانستت لێ فێر ببن، لێیان دوور بگرە و خۆتیانی لێ لابدە؛ چونکە لەم کەسانەدا نە جوانی هەیەو نە دارایی. لەرواڵەتدا دۆستن، لە دڵدا دوژمن؛ لە لای خۆت پەسنت دەکەن، لە پاشملەت خراپەت دەڵێن؛ هەموویان دوڕوو و زمانلووس و خاپێنەرن. مەبەستی ئەمانە ئەوەیە تۆ بکەن بە پەیژە و بە سەرتدا سەر کەون و بگەن بەو دۆزە بێفەڕانەیان. دەتکەن بە کۆلبەری ئارەزووەکانی نەفسیان و بە دەوری شاردا دەتسووڕێننەوە. کە دێنە لات منەتبارت دەکەن و لە هەمبەردا دەیانەوێ ماڵ و گیانت بۆیان بەخت کەی. ئەرک و مافی هەموو خزم و کرێف و دۆست و دەست و پێوەندیان دەبێ ڕاگری و ببی بە گێلۆکەی هۆز و لەگەڵ دۆستیان دۆست بی و لەگەڵ دوژمنیان، دوژمن. ئەگەر جارێک لەگەڵ

---

[1] - حدثنا: پێی گوتین (وشەیەک کە ئەوانەی حەدیس دەڵێنەوە دەیڵێن).

یەکیان بە ئاوەژووی ویستی بجووڵیتەوە، ئەو کات دەزانی چۆنت لەسەر دەدوێن و بە نەیاری خۆیانت دەزانن»[1]. بە راستی هەروایە کە ئەو گوتی، چونکە ئەمڕۆ هیچ شاگردێ بە خۆڕایی ناڕواتە لای مامۆستا؛ سەرەتا مووچەیەکی بەردەوامیان دەوێ؛ بێنەوا مامۆستا، کە نە دەوێرێ شاگرد جواو کا -چونکە دەترسێ لەلای خەڵکی بە گەورەیی ناوی نەبرێ- نە دەشتوانێ بە بێ یارمەتی خواستن و مەرایی بۆ ستەمکارێ، مووچەی ئەم شاگردانەی دابین کا؛ بۆیە هەم هیچی دەست ناکەوێ و هەمیش بڕوای لەسەر ئەوان دەدۆڕێنێ. کەواتە هەرکەس پێی دەکرێ شاگرد رابێنێ و لەم زیانانە بەدوور بێ، مامۆستایی و راهێنانی لێ پیرۆزە و نابێ لە خەڵکی دابڕێ.

بەڵام ئەرکی خەڵکی رەمەکی وئاسایی ئەوەیە، هەرکات کەزانایەکیان بینی کۆڕی وانەی پێک ناوە، لێی دڕدۆنگ نەبن و وانەزانن بۆ گەیشتن بە ناو و نان کۆڕی پێک ناوە و ئارخەیان بن کە ئەو کارەی تەنیا لەبەر رەزای خودایە؛ ئەم بۆچوونە لەسەر خەڵکی ئاسایی فەرز و پێویستە. بەڵام ئەگەر کەسێک دەروونی ناپاک بوو، لە گومانی خراپ بۆش نابێ؛ چونکە مرۆڤ لە چاو خۆیەوە سەیری خەڵک دەکا. مەبەست لەم پەیڤە ئەوە بوو کە زانا ئەرکی خۆی بەجێبێنێ و خەڵکیش بڕ و بیانووی ساویلکانە نەهێننەوە و خراپەی زانایان نەڵێن و دواڕۆژی خۆیان نەفەوتێنن.

**زیانی دووەم** - لە خێرگەیاندن و خێر سەندن بێبەش دەبێ. بەبێ تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی، خێرو قازانجی دونیایی بەدەستهێنان خەونی بەتاڵە. رەوا نییە بۆ ئەوکەسەی خێوی ماڵ و خێزان بێ و خۆی لە سووچێ حەشار بدا و لەخەڵکی بەرپیوار بێو ژن و منداڵی دەسخەڕە کا؛ بەڵام گەر ماڵوسامانی چاکی بوو، خەمی بژیوی خێزانی نەبوو، چاتر وایە خۆی لە خەڵکی دا ببڕێ.

بەڵام خێر گەیاندن بریتییە لە سەدەقەدان و بۆ پەرای موسوڵمانان رابوون. ئەگەر کەسێک لە تەنیاییدا بێجگە لەعیبادەتی رواڵەتی چیدی ناکا، بەدەست هێنانی بژیوی حەڵاڵ و چاکە کردن لەگەڵ خەڵکی بۆی باشترە. بەڵام ئەگەر لە ناخیدا رۆچنەیەک بۆ ناسینی پەروەرندەی داکراوە، ئەم

---

1 - لە پاچڤەی «احیا»دا هاتووە: «ئەبووسلەیمانی خەتتابی راستی گوت کە لە هۆگرانی شاگردیت خۆ بپارێزە؛ چونکە لەم کەسانە نە ماڵت پێدەگات و نەجوانی. بەرواڵەت خۆشەویستن و بەدڵ دوژمنت. لەلای خۆت مەراییت دەکەن، لە پاشملە خوسپەت دەکەن. کە دێنە لات، بە سەر حاڵت دەبنە چاودێر و کە دەڕۆن لە سەر پەیڤی تۆ دەبنە مۆژیار. ئەمانە درۆزن و بوختانکەرو خاپێنەرو ئاکار نزم و زمان لووسن. کە لە دەورت کۆوە دەبن، پێیان هەلمەخلەتە، مەبەستیان فێربوونی زانستت نییە، بەڵکوو چاویان لە ماڵ و سامان و پاگەتە و دەیانەوێ وەکوو نەردیوان بە سەرتدا هەڵزنن و سەرکەون و بتکەن بەبارەبەری ئارەزووە کرێتەکانیان. چونکە ئەگەر لە بەجێهێنانی داخوازێکیان کورتیەک بکەی، دەبنە نەیارو دوژمنی قەستە سەرت. منەتی هاتوچۆیان بە سەرتدا دەنێن و لێت دەخوازن کە ناو و جێ و پاگە و سامانی خۆت بۆیان بەخت کەی، دەگەڵ دوژمنیان، دوژمن بی و لەگەڵ دۆستیان، دۆستایەتی کەی. دەبێ ببیتە ساویلکە بۆیان، هەرچەن زانا بی؛ بۆیە گوتوویانە دابڕان لە خەڵکی رەمەکی، ئەو پەڕی مێرخاسییە.

دووره‌په‌رێزیه‌ی له‌هه‌موو چاکه‌یه‌ک هێژاتره‌، چونکه‌ مه‌به‌ست له‌عیباده‌ت هه‌ر ئه‌وه‌یه‌.

**زیانی سێهەم** - له‌ کۆشه‌وه‌ و پشووودرێژییه‌ک که‌ له‌ سۆنگه‌ی ئاکاری نزمی خه‌ڵکه‌وه‌ بۆی دێته‌دی، بێبه‌ش ده‌بێ. بۆ ئه‌وکه‌سه‌ی که‌ له‌ هه‌موو پله‌یه‌ک سه‌رنه‌که‌وتبێ و له‌کۆشه‌وه‌ رانه‌هاتبێ، ئاکاری به‌رزو رووی گه‌ش، به‌هره‌یه‌کی گه‌وره‌ی هه‌یه‌و له‌ راستیدا بنه‌مایه‌ بۆ هه‌موو عیباده‌تێک و ئه‌مه‌ش به‌بێ‌تێکه‌ڵاوی له‌گه‌ڵ خه‌ڵکی پێک نایه‌، ئاکاری به‌رزیش ئه‌وه‌یه‌ له‌ به‌رانبه‌ر په‌یڤ و کرده‌ی سووک و نزمی خه‌ڵکیدا پشوودرێژ و له‌سه‌رخۆ بێ. خزمه‌تکارانی سۆفییه‌کان بۆیه‌ تێکه‌ڵی خه‌ڵکی ده‌بن، تا به‌ ده‌رۆزه‌یی له‌ خه‌ڵکی، لووت به‌رزی خۆیان بشکێنن، به‌ دانی خه‌رجی سۆفییه‌کان رژدی له‌ دڵدا بتارێنن، به‌ پشوودرێژی له‌سه‌ر کاریان، ئاکاری نزمیان بپاکژ که‌ن و به‌خزمه‌ت و په‌رایيان، دوعاو سکاڵای به‌خێریان بۆ خۆ بکرن و له‌ خێر و ودمیان به‌شدار بن. هه‌رچه‌ن ئێستا مه‌به‌سته‌کان وه‌رگه‌ڕاون، به‌ڵام سه‌ره‌تا مه‌به‌ست وابوو، که‌س په‌رای سۆفییانی بۆ ماڵوسامان و پله‌و پاگه‌ نه‌کرد؛ وه‌کوو ئێستا. به‌ڵام ئه‌وه‌ی زۆر تێکۆشاوه‌و له‌ زۆربه‌ی ئاسته‌کان تێپه‌ڕاوه‌ و زۆر به‌رز و نه‌وی بڕیوه‌و گه‌یشتووه‌ به‌ هۆگری په‌روه‌ردگار، دووره‌په‌رێزی بۆی چاتره‌. چونکه‌ مه‌به‌ست له‌تێکۆشان، ئه‌وه‌ نییه‌ که‌ ره‌نج و ئازاری به‌رده‌وام بداته‌ خۆ، به‌ڵکوو ئه‌و ئازارانه‌ بۆ ئه‌وه‌ن خۆشه‌ویستی په‌روه‌رنده‌ی بۆ بێته‌ دی؛ وه‌کوو ئه‌وه‌ی که‌سێک ده‌رمانێکی تفت و تاڵ بخوا، مه‌به‌ست له‌و ده‌رمانه‌ به‌ره‌نگاری نه‌خۆشی و پێکهێنانی ته‌ندروستیه‌؛ که‌واته‌، ئه‌گه‌ر نه‌خۆش چاک بۆوه‌، ئیدی خواردنی ده‌رمانی تفتی بۆ نیاز نییه‌؛ جا کۆشه‌وه‌ و خۆئازاردانیش هه‌روایه‌، بۆ گه‌یشتن به‌خۆشه‌ویستی خودایه‌. مه‌به‌ست له‌م کۆشه‌وانه‌ سڕینی ئه‌و کۆسپ و ته‌گه‌رانه‌یه‌ که‌ به‌ر به‌ خۆشه‌ویستی په‌روه‌ردگار ده‌گرن. هه‌روه‌ها هه‌روه‌کوو چۆن خۆخستنه‌ ئازار بۆ پاکژکردنی دڵ و ده‌روون پێویسته‌، هاندانی خه‌ڵکیش پێویسته‌ و ئه‌وه‌ش به‌بێ‌تێکه‌ڵاوی ده‌گه‌ڵ خه‌ڵکی پێک نایه‌؛ له‌راستیدا شێخ و مامۆستا ناتوانن له‌گه‌ڵ شاگرده‌کانیان پێوه‌ندییان نه‌بێ و دابڕانی ئه‌و که‌سانه‌ش هیچ ره‌وا نییه‌. به‌ڵام شێخیش وه‌کوو مامۆستایان ده‌بێ خۆی له‌دوڕوویی و مه‌رایی و خۆش‌ویستنی پله‌و پاگه‌، بپارێزی. که‌ خۆی پاراست، تێکه‌ڵ بوون چاتر له‌ دووره‌په‌رێزییه‌.

**زیانی چواره‌م**- ره‌نگه‌ له‌کونجی ته‌نیاییدا وازوازی بوونی به‌سه‌ردا زاڵ بێ و دڵی له‌ یاد و بیری خودا وه‌ڕس بێ؛ چاری ئه‌م ده‌رده‌ش ته‌نیا پێوه‌ندی و دۆستایه‌تی له‌گه‌ڵ خه‌ڵکه‌. ئیبنی عه‌بباس ده‌ڵێ: «ئه‌گه‌ر ترسی وازوازی بوونم نه‌بوایه‌، له‌گه‌ڵ خه‌ڵکی دانه‌ده‌نیشتم». عه‌لی کوڕی ئه‌بیتالیب ده‌ڵێ: به‌ یه‌کجاری رمووده‌یی له‌ دڵ مه‌گرنه‌وه‌، چونکه‌ دڵتان نابینا ده‌بێ.

که‌واته‌، پێویسته‌ هه‌موو رۆژێ ماوه‌یه‌ک به‌ ئاخاوتن له‌گه‌ڵ دۆستێ رابوێرێ. ده‌بێ ئه‌و دۆسته‌ و ئه‌و په‌یڤانه‌ش، له‌سه‌ر دونیا نه‌بن، به‌ڵکوو ده‌بێ باسی بارودۆخ و چه‌ندوچوونی دڵ و ده‌رون و

چۆنییەتی دەرمانی کەمایەسییەکان بێ. بەڵام دانیشتن و ئاخافتن لەگەڵ بێخەبەران، هەرچەن کەمیش بێ، بەڵام زیانی هەیەو هەموو عیبادەتەکانی ئەو ڕۆژە بە خەسار دەدا. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی کاریگەری زۆر لە دانستەکانی هەڤالانی وەردەگرێ، دەبێ ئاگادار بێ و بزانێ لەگەڵ کێ دۆستایەتی دەکا».

**زیانی پێنجەم** - دابڕان لە خەڵکی دەبێتە هۆی فەوتانی خێری سەردانی دۆست و نەخۆش و ئەسپەردەی مردوو و بانگهێشتن و پیرۆزبایی و سەرەخۆشی و بە گشتی بەجێهێنانی ئەرکی خەڵکی. لەم کارانەشدا زیان زۆروزەوەندەیە و مەرایی و دوڕوویی دڕنی تێدا کردووە و ئەوەی پێی نەکرێ لەم خەسارانە خۆ ببوێرێ، چاتر وایە لە خەڵک داببڕێ و خۆی دوور بگرێ، لە پێشوونان زۆر کەس بووگن، چشیان لەم خبڕانە کردووە و پاکی خۆیان پاراستووە.

**زیانی شەشەم** - لە پێوەندی و بەجێهێنانی ئەرکی سەرشان لە هەمبەر خەڵکوخوا، جۆرێک خۆبەکەمگری هەیە، کەچی لە دابڕاندا دەمارزلی دێتە بەرچاو؛ تەنانەت بووز دەخوا کە مەبەست لەدوورەپەرێزی، لووتبەرزی بێ و ئەو کەسە بیەوێ خەڵکی بێنە سەردانی و ئەم سەردانی کەس نەکا.

دەڵێن لە نێو ڕۆڵەکانی ئیسرائیلدا زانایاکی زۆر گەورە بوو، سێسەدوشەست پەرتووکی لەسەر ژیری و زانایی نوسیبوو. پێی وابوو، ڕەنگە ئێستا پەروەردگار خۆشی بوێم. پەیغام ناردرایە سەر پێغەمبەری ئەو سەردەمە و گوتی: «پێی بڵێ لەسەر زەویدا ناوبانگی خۆت دەرکردووە، من ئەم هەموو ناو و دەنگە ناسەلمێنم». زۆر ترسا، خۆی پەستاوتە سووچێک و گوتی: «بڵێی ئێستا پەروەرندەم لێم خۆش ووبێ؟» پەروەردگار گوتی: «لێی خۆش نیم». هاتە دەر و ڕۆیشتە نێو بازاڕو دەگەڵ خەڵکی تێکەڵاو بوو و لەگەڵیان هەڵسان و دانشتنی هەبوو، خۆراکی دەخوارد، هاتوچۆی دەکرد، تا ئەوەی پەروەردگار گوتی: «هەنووکە لێی خۆش بووم».

ڕەنگە کەسی واش هەبێ لە سۆنگەی خۆبەزلزانیەوە لە خەڵک دابڕابێ، چونکە دەترسێ لە نێو کۆڕوکۆمەڵدا تەیار بێ و خەڵکی ڕێزی زۆری لێ نەنێن، یا خۆ دەترسێ کە کەمایەسی زانست یا کردەوەی لە خەڵک خویان بێ، بۆیە کونجی تەنیایی گرتۆتە گیانەوە و بەردەوامیش تامازرۆیە کە خەڵکوخوا سەردانی بکەن و کڕنۆشی بۆ بەرن و دەستی ڕاموسن و بە ودم و پیرۆزی بزانن؛ ئەم دوورەپەرێزییە، ڕاست هەمان دوڕوویییە.

نیشانەی دابڕانێ کە بۆ خودا بێ، دووشتە: **یەکەم** لە تەنیاییدا بێکار نەبێ؛ واتە خەریکی بیرو یاد و زیکری خودا بێ و بپەرژێتە سەر عیبادەت و کۆکردنەوەی زانست و زانیاری. **دووەم**، سەردانی خەڵکی پێ ناخۆش بێ و بە دزیوی بزانێ، مەگەر کەسێک بەهرەی دینی پێ بگەینێ.

ئەبولحەسەنی حاتەمی لە پیاوماقوولانی تووس بوو. بۆ سەردانی ئەبولقاسمی گورگانی ڕۆیشت، ئەویش لە گەورەکانی دین بوو. گوتی داوای لێبوردنت لێ دەکەم کە کەمتر سەردانت دەکەم. گوتی «گەورەم! داوای لێبوردن مەکە. هەموو کەس سوپاس بۆ هاتن دەکەن، بەڵام من سپاسی نەهاتن؛ ڕاستیەکەی ئەوەیە، بیری هاتنی پێمێرد[1] تاقەتی هاتنی کەسی بۆ نەهێشتووم».

پادشایەک ڕۆیشتە لای حاتەمی ئەسم، گوتی: «نیازت چییە، بۆتی پێک بێنم؟» گوتی: «ئەوەی کە نە بمبینی و نە بتبینم».

دوورەپەرێزی بۆ بەدەست هێنانی ڕێزی خەڵکی، گەوجیەکی زۆر گەورەیە؛ چونکە کەمترین ئاستی ئەوەیە کە دەبێ بزانێ هیچ شت بە دەست خەڵکی نییە؛ ئەوەش بزانێ کە ئەگەر بڕواتە سەر کێوێک و کەس نەبینێ، هەندێ پێی دەڵێن «دوڕوویی دەکا»، یان گەر بڕواتە نێو مەیخانەوە، ئەوانەی خۆشیان دەوێ دەڵێن: «خۆی خستۆتە نێو ڕێبازی لۆمە[2]، تا لە پێش چاوی خەڵکی بکەوێ».

سەهلی توستەری ئەرکێکی بە یەکێک لەموردیدەکانی سپارد. مورید گوتی: «لە ترسی زمانی خەڵک پێم ناکرێ». سەهل رووی کرد لە یارانی و گوتی: «کەس بەراستەقینە ناگات تا یەکێک لەم دوو تایبەتمەندییەی بۆ پێک نەیێ: یا خەڵکوخوای لەچاو بکەوێ و بێجگە لە پەروەردگار چیدی نەبینێ، یا خۆ نەفسی خۆی لەبەر چاو بزڕێنی و بۆی گرینگ نەبێ خەڵک چی پێ دەڵێن».

بە حەسەنی بەسرییان گوت: «تاقمێ دێنە نێو بازنەی دەرست، پەیڤەکانت فێر دەبن و دژ بە خۆتی بە کار دەبەن». گوتی: «نیازی من گەیشتن بە بەهەشتی بەرین و نزیک بوونەوە لە پەروەرندەمە، قەد ئارەزووی ڕەزامەندی خەڵکم بە دڵدا نەهاتووە؛ چونکە ئەمانە تەوس و توانجیان لە خودای خۆشیان ناگێڕنەوە».

بەمەی بێژرا چاک و خراپی دوورەپەرێزی خویان بوو؛ هەرکەس بە نیاز بوو، با چەند و چوونی خۆی بزانێ و لە هەمبەری ڕابینێ و بزانی چی بۆی چاترە.

## نە ریتە کانی دوورە پە رێزی

ئەوەی تەمای دوورە پەرێزی کرد، با بەدڵ بڵێ مەبەستم لەم دابڕینە ئەوەیە کە ئازارم بە کەس نەگا و ئازاری کەسم پێ نەگا و بپەرژێمە سەر عیبادەتی پەروەرندەم.

---

١- پێمێرد: عزرائیل.

٢ - لۆمە : «ملامت» یان «ملامتیان» تاقمێکن کە خۆ دەخەنە بەر لۆمە و پلاری خەڵک، تا بێجگە لە پەروەردگار هیچ نیازێکیان بۆ نەمێنێ.

نابێ بەتاڵ دانیشێ و دەبێ خەریکی بیر و ویر و زانین و کردەی جوان بێ؛ تا بۆی دەکرێ لە خەڵک دوور بێ، لە باس و قسەی شار نەپرسێ، کاری بە باری خەڵکەوە نەبێ؛ چونکە ئەوەی کەوتە بەرگوێی، وەکوو توویەک لەدڵیدا دەچێنرێ و لەتەنیاییدا سەرهەڵدەبڕێ. گرینگترین کار لە تەنیاییدا، دابڕان لە پەیڤی نەفسە و هەواڵی ژینی خەڵکوخواش گەرای پەیڤی نەفسە لەدڵدا. دەبێ بە کەمترین خواردن بژی، ئەگینا ناچار دەبێ روو لەخەڵک کا.

دەبێ لە هەمبەر ئازاری دراوسێکانی پشوودرێژ و بەکاوەخۆ بێ و گوێ بە لۆمە و پەسنیان نەدا و دڵی پێ نەبەستێ؛ ئەگەر بەدوڕوو یان یەک ڕوو، بە لووتبەرز یان ئاکاربەرز ناویان برد، هیچ گوێی پێ نەدا؛ چونکە ئەوانە ژیانی دەشڵەژێنن. لەراستیدا مەبەست لە دوورەپەرێزی و دابران، نوقم بوونە لەنێو کاری دوارۆژدا.

## بنەمای حەوتەم - نەریتەکانی سەفەر

سەفەر دووجۆرە: یەک لە ڕواڵەتدا و یەک لە دەروونیدا.

سەفەری دەروون، سەفەری دڵە لە نێو مەلەکووتی ئاسمان وزەوی و سەیر و سەمەرەی دەسکردەکانی پەروەردگار و هەوارگەکانی ڕێگای دین. سەفەری پیاوان ئەوەیە کە بە لەش لە ماڵ بن و بە دڵ لە بەهەشتدا -کە پانتای چەن بەرانبەری حەوت ئاسمان وزەوین و بگرە پتریشە- پیاسە دەکەن. چونکە عالەمەکانی مەلەکووت، بەهەشتی خواناسانە؛ ئەو بەهەشتەی کە داپچڕان و کۆسپ و چەلەمەی تێدا نییە. پەروەردگار کاتێ دەڵێ أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ[1]، مەبەستی هەر ئەم سەفەرەیە. ئەوانەش کە هازی ئەم سەفەرەیان نەبێ، دەبێ بە لەش ڕێگای سەفەر ببڕن تا لە هەر شوێنێکدا قازانجێکیان بەرکەوێ. ئەمە وەکوو ئەو کەسەیە کەڕێگای کەعبە بگرێتە بەر و ئازاری ڕێ بداتە خۆ، تا دیوار و دار و بەردی کەعبە ببینێ؛ بەلام ئەویتریان وەکوو ئەوەیە کە لە ماڵی خۆی بێ و کەعبە بێتە لای و بە دەوریدا بسووڕێتەوەو نهێنیەکانی خۆی پێی بڵێ؛ جیاوازی ئەم دوانەش گەلێک زوروزەوەندەیە. بەم بۆنەوە بوو کە شیخ ئەبووسەعیدی ئەبولخەیر گوتی: «تا خەڵکی ئازاری ڕێ بدەنە خۆ، خاوەن دڵان گەیشتوونەتە مەنزڵگا».

نەریتەکانی سەفەری ڕواڵەت لە دوو بەشدا ڕاڤە دەکرێن؛ بەلام سەفەری دەروون وردەکاری زۆری هەیە و لەم کتێبەدا نایێتە گوتن:

**بەشی یەکەم** - مەبەست لە سەفەر و نەریت و جۆرەکانی؛

**بەشی دووهەم** - پەیڤین لەسەر ئەو زانستانەی بۆ سەفەر پێویستن.

---

١- (قورئان، ٧/ ١٨٥) ئاخۆ ئەوان لە دام و دەزگای پڕشکۆی عاسمانەکان و زەمین و هەرچی خوا دروستی کردوون، ناڕوانن.

## بەشی یەکەم - مەبەست و نەریت و جۆرەکانی سەفەر

### سەفەر پێنج جۆرە:

**سەفەری یەکەم:** بۆ فێربوونی زانستە: چونکە فێربوونی زانست پێویستە، ئەم سەفەرەش فەرزە؛ هەروەها کە فێربوون سوننەت بوو، ئەم سەفەرەش سوننەتە.

سەفەر بۆ فێربوون سێ جۆرە:

**یەکەم** بۆ فێربوونی زانستی شەرع. لە خەبەردا واهاتووە کە «هەرکەس بە مەبەستی فێربوون لە ماڵ بێتەدەر، تا کاتی گەڕانەوە لەسەر ڕێبازی پەروەردگارە». لە نێو پێشووناندا کەسی وابووە کە بۆ فێربوونی تاقە حەدیسێک، سەفەری درێژی داوەتە بەر خۆ. شەعبی دەڵێ: «ئەگەر کەسێک بۆ فێربوونی تاقە وشەیەک کە کەڵکی بۆ دوارۆژی بێ، لە شامەوە بۆ یەمەن بڕوا، سەفەرەکەی بە فێڕۆ نەچووە». زانست دەبێ بە کاری توێشووی دوارۆژ بێ، زانستێ کە لە دونیاوە بۆ دوارۆژ، لە ڕژدییەوە بۆ چاوتێری، لە دوڕووییەوە بۆ یەکڕوویی و لە بەندەگی خەڵکەوە بۆ بەندەگی پەروەردگاری ڕانەکێشێ، زیانی تێدایە.

**دووەم** - هەیە سەفەر دەکا تا ئاکاری خۆی بناسێ و چاک و خراپی لێک کاتەوە و خۆی لە هەرچی ئاکاری نزمە پاکژ کاتەوە. ئەمەش گەلێک گرینگە، چونکی تا مرۆڤ لە ماڵی خۆیدا بێ و کارەکانی بە پێی ویستی خۆی بگەڕێ و هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکی بۆ نەیەتە دی، وا دەزانی هەموو کردە و ئاکارێکی بەرز و جوانن؛ بەڵام لە سەفەردا پەردە لەسەر دەروونی لادەدرێ و چاک و خراپی خویان دەبێ و هۆی خراپیەکانی لێ روون دەبێ و ئەوسا دەتوانێ چاری خۆی بکا. ئەوەش پێ لە سەفەر نەنێ، لە کارەکانیدا پیاوانە نابزوێتەوە. بێشری حافی گوتی: «قورئان خوێنەکان! سەفەرکەن تا پاڵفتە بن؛ چونکە ئاو کە لە جێی خۆی قەتیس ما، دەگەنێ».

**سێهەم** - کەسی واش هەیە کە سەفەر دەکا تا سەیر و سەمەرەی دەسکردەکانی خودا لە وشکی و زەریا، لە کێو و چۆڵ و سارا ببینێ و هەموو جۆری دەسکردەکانی پەروەرندەی لە ئاژەڵ و ڕوەک، لە هەموو شوێنی ئەم جیهانە بناسێ و بزانێ کە سەرلەبەری ئەمانە خەریکی پەسن و کڕنۆشی پەروەردگارن. ئەوەی چاوی دڵی کرایەوە و پەیڤی دار و بەردی لێ خویان بوو و ئەم نووسینەی -کە بێپیت و وشە و ژمارەیە- لێ ئاشکرا بوو، ئیدی پێویست ناکا بە ئاقاری ئەم جیهانە پان و بەرینەدا بگەڕێ تا پەیڤیان ببیسێ، بەڵکوو بۆی هەیە نەختێ سەر هەڵبڕێ و لە مەلەکووتی ئاسمان ورد بێتەوەو گوێ لە پەیڤی ئەم جیهانەی کە شەو و ڕۆژ بە دەوریدا دەسووڕنەوە بگرێ کە پێی دەڵێن:

وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ[1]. تەنانەت ئەگەر کەسێک لە چۆنییەتی رسکانی خۆیدا رامێنێ، ئەوەندە سەیر و سەمەرە لە خۆیدا دەبینێ کە دەبێ سەرلەبەری تەمەنی بۆ تەرخان کا. بەڵام مرۆڤ تەنیا کاتێک دەتوانێ لە راستەقینەی خۆی بگات کە واز لە چاوی سەر بێنێ و بە چاوی دڵ بروانێ.

گەورەیەک دەڵێ: «خەڵکی دەڵێن چاو هەڵبرن تا سەیر و سەمەرەکان ببینن، کەچی من دڵێم چاو لێک بنێن تا سەیر و سەمەرە ببینن». هەردووی ئەمانە راستن، چونکە سەرەتا دەبێ چاوی سەربکاتەوە و لە دەسکردەکانی خودانیدا رامێنێ و پاشان بگاتە مەنزڵگای‌تر. سەیر و سەمەرەی ئەم دونیایە رادەیەکی دیاری هەیە و زۆر بەرتەسکە. بەڵام سەیر و سەمەرەکانی دەروون رادەیان نییە، چونکە پێوەندی بە جیهانی رۆح و راستەقینەوە هەیە و راستیش هیچ تخووبێکی نییە و لەگەڵ هەر رواڵەتێک گیانێک و راستەقینەیەک هەیە: رواڵەت بەشی چاوی سەرە و راستەقینەش بەشی چاوی دەروون؛ رواڵەت ئێجگار بێفەرە. وەکوو ئەوەیە کە کەسێک زار ببینێ و پێی وا بێ لەتێ گۆشتە و دڵ ببینێ و پێی وابێ لەتێ خوێنی رەشە.

جا دەبێ تێفکری و وردبێتەوە و بزانێ راستەقینەی دڵ و زمان چییە و جیاوازی نێوان دڵ و زمانی راستەقینە و رواڵەتی چەندە. ورد و درشتی ئەم جیهانەش هەروایە. ئەوەی لە چاوی سەر، سەرتری پێنەدرا، لە ئاستی چوارپێیان تێنەپەڕا. بەڵام لە هەندێ خەبەردا واهاتووە کە «چاوی سەر، توێکڵی چاوی دەروونە». کەواتە، سەفەر بۆ دیتنی سەیر و سەمەرەکانی ئەم جیهانەش لە خێر و قازانج بێوەر نییە.

**سەفەری دووەم** – ئەم بۆ پەرستنی پەروەردگارە: وەکوو حەج و خەبات و سەردانی گۆڕی پێغەمبەران و یارانی پێغەمبەر و یارانی یارانی پێغەمبەر؛ تەنانەت سەردانی زانایان و گەورەکانی دین، چونکە سەیری ئەم کەسانەش عیبادەتە و ودمی دوعای بەخێریان زۆروزەوەندەیە. یەکێک لە ودمەکانی دیتنی زانایان و پیاو چاکان ئەوەیە کە مرۆڤ هان دەدرێ بۆ دانەپەییان. کەواتە، دیداریان هەم عیبادەتەو هەم تووی عیبادەتانی‌تر لە دڵدا دەچێنێ؛ هەروەها چونکە ودمی هەناسە و گفتی جوان و لفتی رەوانیان لەگەڵ دیداریان تێکەڵ دەبێ، خێر و قازانجی چەن بەرانبەر دەبێ.

رۆیشتن بۆ سەرقەبری گەورەکانی دین رەوایە. ئەمەی کە پێغەمبەر فەرمووی: «لا تُشَدُّ الرِّحالُ الاّ اِلی ثَلاثَة مَساجِدُ»، مەبەست مزگەفتی مەککە و مەدینە و بەیتولموقەددەسە؛ مەبەست ئەوەیە کە تەنیا ئەم سێ مزگەوتە مفرکەن[2]؛ بەڵام هەر وەکوو چۆن سەردانی پیاوچاکان و زانایان ناڕواتە ئەم خانەوە،

---

١ ـ قورئان (١٠٥/١٢) چەندە زەحفن نیشانەگەل لە عاسمان و زەمیندا؛ بەلایاندا رادەبرن و گوێی پێ نادەن. (هـ)

٢- مفرکەن: جیاواز.

سەردانی مردوانیش هەروایە. کەواتە سەفەر بۆ سەردانی قەبری پێغەمبەران و دۆستانی خودا و زانایان رەوایە.

**سەفەری سێهەم** - هەلاتن لەو شتەی دەبێتە هۆی ئاژاوەی دل و دین، وەکوو مال‌وسامان و کار و ئەرکی دونیایی. ئەم سەفەرە بۆ ئەو کەسەی کە کاری دونیا هێزی کاری دینی بۆ نەهێشتبێ، پێویستە؛ چونکە رێگای دین تەنیا بە هێوری و ئاسوودەگی دەبینرێتەوە؛ هەرچەند مرۆڤ قەد لە دونیا بێ‌نیاز نابێ، بەلام بۆی هەیە باری دونیای کەم کاتەوە و خاترجەمتر رێگاببڕێ. «وَ قَد نَجَا المُخَفَّفُون»؛ واتە: بارسووکان رزگارن، هەرچەن بێ بارنین. زۆربەی ئەوانەی مال و ملک و سامان کۆوە دەکەن، بیریان لە لای پەروەرندەیان نامێنێ.

سەفیانی سەوری دەلێ: «رۆژگارێکی کرێتە؛ نەناس و بێ‌ناو ترسی لەوەیە کە مرۆی بەناوبانگ چی پێ دەگا! رۆژگاروایە لە هەر کوێ کە ناسیتیان، دەبێ هەلێی و روو لەو شوێنە کەی کە کەس ناتناسێ». جارێک سەفیانیان بینی کە هەنبانەیەکی لە کۆل ناوە و بلەز دەڕوا. گوتیان «بۆ کوێ دەڕۆی؟» گوتی: «ئەڕۆم بۆ فلان گوند، دەلێن لەوێ بژیو هەرزانترە». گوتیان: «ئەم جۆرەت پێ رەوایە؟» گوتی: «لە هەر کوێ بژیو هەرزانتر بوو، بۆ ئەوێ برۆن؛ چونکە لەوێ دینتان لە فەوتان و دلتان لە پەرژانە سەردونیا رزگار دەبێ». ئیبراهیمی خەوواس لە هیچ شارێک پتر لە چل رۆژان نەدمایەوە.

**سەفەری چوارەم** - بازرگانیە بۆ مالی دونیا. ئەم سەفەرە رەوایەو ئەگەر مەبەست بێ‌نیازکردنی خۆ و ژن و مندال بێ لە خەلکی، ئەمەش هەر عیبادەتە؛ بەلام ئەگەر مالی زۆرو زەوەندی بۆ خۆهەلکێشان و فیز و دەمار بوێ ، ئەم رێبازە، رێی شەیتانە. زۆرتری ئەم کەسانە هەموو تەمەنیان بە دەرد و رەنجی سەفەر رادەبرێ؛ چونکە ئەم کەسانە چاوتێریان بۆ نییە و لە کۆتاییدا کە رێگایان دەبڕێتەوە، یا مال‌وسامانیان بە تالان دەبرێ، یا لە ولاتی بیانی دەمرن و خونکار سامانیان داگیر دەکا. یا ئەگەر زۆریان بەخت هەبێ، میراتبەران، سەرلەبەری سامانیان دابەش دەکەن و بۆ رابواردنی خۆیانی خەرجی دەکەن و جارێکیش یادیان لێ ناکەن و تا بۆیان بکرێ قەوینتیەکانی دەخەنە پشت گوێ و قەرزەکانی نادەنەوە و خۆیان دەمێنن و ئۆبالی دواڕۆژیان. هیچ زیان و خەسارێ پتر لەمە نییە کە کەسێ هەموو ئازارەکان بچێژێ، گوناحەکان بکێشێ، کەچی کەسی‌تر پێوە رابوێرێ.

**سەفەری پێنجەم** - سەفەری سەیران و رابواردن. ئەم سەفەرە گەر جاربەجار و کەم بێ، رەوایە. بەلام ئەوەی بەبێ‌مەبەست و ئارمانج، خووی بە گەڕان گرتووە و تەنیا پێیخۆشە شار و خەلکی نوێ ببینێ و بێجگە لەمە نیازی نییە، لەمەدا زانایان رای جۆراوجۆریان هەیە:

تاقمێ گوتوویانە: «ئەمە خۆ خستنە ئازارە و هیچ کەلکی نییە و ناڕەوایە». بەلام بە رای من حەرام

نییە، چونکە سەیرانیش خۆی مەبەستە، هەرچەند مەبەستێکی کەم نرخ. حەلاڵ بوونی کردەی هەرکەس بە گوێرەی خۆیە، ئەوانەی خۆیان کەمنرخن، دۆزەکانیشیان هەروان.

بەلام تاقمێ سیپاڵ پۆش، خۆ لە بەرگی سۆفییان دەکەن و دەکەونە گەڕیان بەبێ ئەوەی هیچ مەبەست و دۆزێکیان بێ، یا خۆ بیانەوی بگەنە پەرای پیرێکی ڕێزان و بەهرەی لێ بگرن؛ ڕێگای دڵ و دەروونی ئەمانە داخراوە، تەنیا مەبەستیان سفرەیەکی داچنراوە؛ لە هەر کوێ نان و خوانێکی چاکیان بینی، دەواریان لەوێ هەڵدەدن تا ئەوکاتەیان ڕابوێرن و نان و خوانیان بە دڵ بێ. کە نەختێ نان و خوان کز بوو، ڕوو لە خانەخوێ هەڵدەماڵن و لەوێ بار دەکەن و ڕوو لە شارێکیتر دەنێن. هەندێ جار لەسەر گۆڕی پیرێ، زانایێ دەمێننەوەو دەڵێن مەبەست هەر ئێرە بوو، کەچی درۆ دەکەن. ئەمانە بە تەوەزەلی و تەمەڵی خوویان گرتووە و بەردەوام لە شوێنێک دەگەڕێن کە تیێدا ڕابوێرن.

هەرچەن ئەم سەفەرە حەرام نییە، بەلان کرێت و ناحەزە؛ ئەم تاقمەش هەرچەن گوناحکار و سەربزێو و داوێن پیس نین، بەلام دزیون. هەرکات کە نانی سۆفییەکانیان خوارد و خۆیان لە جلکی ئەواندا بۆ خاپاندنی خەڵکی، پیشان دا، سەربزێو و داوێن پیسن؛ ئەوەش کە دەیخۆن حەرامە. چونکە هەرکەس سیپاڵی لەبەر کرد و پێنج فەرزەی نوێژی خوێند، نابێتە سۆفی. سۆفی ئەوەیە کە دۆزێکی بێ و لە دووی بگەڕێ یا پێی گەیشتبێ یان خەریکی کۆشەوە بێ بۆ پێگەیشتنی، یاخۆ کەسێک بێ کە پەرای ئەم کەسانەکا. نانی سۆفی بێجگە لەم کەسانە بۆ کەسیتر حەلاڵ نییە.

مرۆڤی لووتبەرز کە دەروونی لە دۆزی بەرز و کۆشەوە بۆ گەیشتن بەو دۆزە خاڵی بێ و هیچ خزمەتی سۆفییان نەکا، تەنیا بە دەبەرکردنی سیپاڵ نابێتە سوفی؛ بەڵکوو ئەگەر شتێکیان بۆ ڕێگران وەقف کردبێ، بۆ ئەویش هەیە؛ چونکە کەسێک بەبێ ئەوەی خۆی سۆفی بێ و تەنیا بە مەرجی دەبەرکردنی بەرگیان، خۆ لەریزی ئەوان دابنێ، ئەو کەسە دوڕوو و ڕێگر و جەردەیە. خراپترینیان ئەو کەسەیە کە چەند وشە لە پەیڤی سۆفییەکان فێر بێ و بەردەوام دووپاتەی کاتەوەو پێی وابێ لە سەرلەبەری ڕێگایان گەیشتووە. ڕەنگە بەد فەڕی ئەم وشانە بگاتە ئاستێ کە بە سووکی سەیری زانا و زانستیان کاو تەنانەت ڕەنگە شەرعیشی لەبەر چاو سووک بێ و بڵێ: «ئەمە بۆ سست و بێهێزانە، کەسانێک کە لەم ڕێگایەدا بە هێز بووبێتن، هیچ شت بۆیان زیانی نییە و دینیان بۆتە دوو سەوە[1] و هیچ پیسایییەک ناگرێتە خۆ». کە کەسێک گەیشتە ئەم ڕادە، کوشتنی لە کوشتنی هەزار کافر هێژاترە؛ چونکە خەڵکوخوا خۆیان لە کافران دەبوێرن، کەچی ئەم لەحنەت لێکراوانە بە زمانی لووس و قسەی پووچ بنەمای موسوڵمانی تێک دەدەن. شەیتان بۆ لە خشتەبردنی موسوڵمانان هیچ

---

[1] - دوو سەوە: قلتین؛ ئاوی «کر» کە بە پیسی پیس نەبێ.

داوێکی وای نەناوەتەوە و زۆر کەس لەم داوە گیریان کردووە و فەوتاون.

**نەریتەکانی سەفەر:**

**نەریتەکانی سەفەر لە ڕواڵەتدا، لە سەرەتا تا کۆتایی**

ئەوەش هەشت نەریتە:

**یەکەم** - سەرەتا دەبێ مافی خەڵکی بداتەوە، قەرزەکانی بگێڕێتەوە و داوای گەردن ئازایی کاو بژیوی ژن و منداڵی دابین کاو بۆیان دابنێ و تویشووی پاکژ بە دەست بێنێ و بە قەدەر نیازی خۆی و هاوڕێیانی لێی هەڵبگرێ؛ چونکە خواردنەدانان و گفتی خۆش لەگەڵ هاوڕێیان، لەریزی ئاکاری بەرزە.

**دووەم** - هەڤاڵێکی چاک و دیندار ببینێتەوە تا لە دیندا ئاریکاری بێ. پێغەمبەر لە سەفەری تەنیا نەهی کردووە و گوتوویە: «سێ کەس کۆمەڵێکن». دیسان فەرمووی «دەبێ یەکێک لەو کۆمەڵە بکرێتە سەرۆک». لە سەفەردا بیروڕای جیاواز دێتە ئاراوە و هەر کارێکیش کە چەن بەرەیی تێکەوت، ئەنجامی فەوتان و لەناوچوونە؛ تەنانەت ئەگەر ئەم جیهانەی تێیدا دەژین، خێوی دوو خودان بوایە، بێشک تەفر و توونا دەبوو. دەبێ سەرۆکی سەفەر کەسێک بێ کە ئاکار بەرزتر و گەڕیدەتر و شارەزاتر بێ.

**سێهەم** - لە دۆستانی مالاوایی کاو دوعایەک کە پێغەمبەر فەرمووی، بیڵێ: « أَستَودِعُ اللهَ دِینَکَ وَ أَمانَتَکَ وَ خَواتِیمَ عَمَلِکَ». کاتی یەکێک لە نزیکانی پێغەمبەر بۆ سەفەر دەڕۆیشت، دەیفەرموو: «زَوَّدَکَ اللهُ لاتَّقوی وَ غَفَرَ ذَنبَکَ وَ وَجَّهَکَ لِلخَیرِ حَیثُ تَوَجَّهتَ». گوتنی ئەم نزایە سوننەتە بو ئەو کەسەی ڕوانەی دەکا. کاتێ مالاوایی دەکا، دەبێ دۆستانی بە خوا بسپێرێ. جارێک عومەر خێراتی دەدا. کابرایەک هاتە لایان، منداڵێکی لە گەڵا بوو. عومەر گوتی: «پاک و بێخەوشە پەروەرندەم! تا ئێستا کەسم نەدیوە ئەوەندە لێکتر کەن». پیاوەکە گوتی: سەربەهووردێکی سەیرت بۆ بگێڕمەوە: بۆ سەفەر دەڕۆیشتم، خێزانم بەم منداڵە زکی پڕ بوو. گوتی: «هەروام بەجێ دێڵی؟» گوتم: « أَستَودِعُ اللهَ مَا فِی بَطنِکَ»[1] کە گەڕامەوە خێزانەکەم مردبوو. شەوێک دەگەڵ خزمان قسەمان دەکرد، ئاورێکم لە دوورەوە بینی، گوتم ئەو چییە؟ گوتیان «ئەوە هی گۆڕی ژنەکەتە». هەموو شەوێ ئەوەم دەدی. گوتم پەروەرندەم! ئەم ژنەم نوێژخوێن و ڕۆژووگر بوو، ئەم ئاورە چییە؟ ڕۆیشتم قەبرەکەم داوە، تا بزانم چ باسە. چرایەکم لە سووچێکە بینی دانرابوو، ئەم منداڵەش یاری دەکرد. دەنگێکم هاتە گوێ

---

[1] ـ بە خودام ئەسپارد ئەوەی لە زگتدایە.

کە پێی گوتم: «ئەم منداڵەت بە من ئەسپارد، گەر دایکەکەیشت پێم بسپاردایە، دەتدیەوە».

**چوارەم** – دەبێ دوو نوێژ بخوێنێ: یەکەم نوێژی «استخارە» بەر لە سەفەر. ئەو نوێژ و گازندەیە بە ناو بانگە؛ دووەم کاتی رۆیین چوار رەکات نوێژ بەجێبێنێ. ئەنەس دەڵێ: زەلامێ هاتە لای پێغەمبەر و گوتی نیازی سەفەرم هەیە و قەوینتی خۆمم نووسیوە، بیدەم بە بابم یا خو کورِم یان برام؟ پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی نیازی سەفەری بوو، لە لای پەروەرندەی هیچ جێگرێکی هێژاتر لە چوار رەکات نوێژ بە جێ نەهێلا». کاتێ باروبنەی لێک ناوە و بە تەمای ماڵاوایی و رۆیینە، ئەو نوێژەی بەجێبێنێ. لە هەر رەکاتدا جارێک «الحمد لله» و جاری «قل هو الله» بخوێنێ و کە دوایی هێنا بڵێ: «اَللّهُمَ اِنّی اَتَقَرَّبُ بِهِنَّ اِلَیکَ فَاخلِفنِی بِهِمَّ فِی اَهلِی وَ مالِی وَ وُلدی، فهی خلیفته فی اهله و ماله»[1]. ئەو نوێژە دەبێتە جێگری لە کاتی نەبوونیدا و لە نێوان خاوخێزان و ماڵیدا چاودێری و پاسەوانی دەکا تا ئەوەی لە سەفەر دەگەرِێتەوە.

**پێنجم** – کە گەیشتە بەر دەرکی ماڵەکەی بڵێ: «بِسمِ اللهِ وَ بِاللهِ تَوَکَّلتُ عَلَی اللهِ وَ لا حَولَ وَ لا قُوَّةَ اِلّا بِاللهِ. رَبِّ اَعوُذُبِکَ اَن اَضِلَّ اَو اُضِلَّ اَو اَزِلَّ اَو اُزِلَّ اَو اَظلِمَ اَو اُظلِمَ اَو اَجهلَ اَو یُجهلَ اَو یُجهَلَ عَلَیَّ»[2]. کە بەسەر چوار پێی دانیشت بڵێ: « سُبحانَ اَلّذی سَخَّرَ لَنا هذا وَ ما کُنّا لَهُ مُقرنینَ وَ اَنّا اِلی رَبِّنا لَمُنقَلِبوُن». هەروەها هەوڵ بدا بەیانی رۆژی پێنج شەمۆ سەفەرکا؛ چونکە پێغەمبەر لەو کاتەدا سەفەری دەکرد. ئیبنی عەبباس دەڵێ: «هەرکەس نیازی سەفەری هەبوو، یاخۆ شتێکی لە کەسێک داوا کرد، دەبێ بەری بەیانی جێبەجێی کا، چونکە پێغەمبەر فەرموویە: « اَللّهُمَّ بارِک لِاُمَّتِی فِی بُکُورِها یَومَ خَمیسِها»؛ هەروەها گوتی: « اَللّهُمَّ بارِک لِاُمَّتِی فِی بُکُورِها یَومَ سبتِها وَ یَومَ خَمیسِها»[3]؛ کەواتە بەرەبەیانی شەمۆ و پێنج شەمۆ خێر و ودمی زۆروزەوەندەیە».

**شەشەم** – باری سووک لە چوار پێی بنێ و لەسەر پشتی چارەوێکەی بۆ ماوەی درێژ رانەوەستێ و خەوی لێ نەکەوێ و بە دار لێی نەداو بەیانی و شەوان ماوەیک بە پێی خۆی برِوا تا چارەواکەی نەختێ پشوو بدا و دڵی خێوی چارەواکەش شادکاتەوە. هەندێ لە پێشوونان کە چارەوێکیان بە کرێ دەگرت، کرێی زۆرتریان دەدا بەو مەرجەی قەد لە وڵاخەکە دانەبەزن، تا کاتێ بە پێی خۆیان رێیان دەبرِی و دادەبەزان، ئەوە بۆیان سەدەقە بێ. هەرکەس بە بێ هۆ و بە ناحەقی بدا لە وڵاخەکەی، یا خۆ باری گرانی لەسەر بنێ، لە رۆژی بەسڵاندا دەبێ پەرسڤدەری ئەو کارەی بێ. ئەبوودەردا حوشترێکی مرد؛ گوتی: «ئەی حوشتر! لە لای پەروەندەم گلەم لێ نەکەی، خۆت دەزانی باری

---

[1] ـ پەروەرندەم! بەم نوێژە خۆمت لێ نزیک دەکەمەوە و بە بۆنەی ئەم نوێژەوە چاوەدێری ماڵ و ژن و منداڵم بە.

[2] – ئەو دوعایانەی لێرەدا واتاکەیان نەنووسراوە، لە بنەمای ئۆهەم (یادی پەروەردگاردا) هاتووە.

[3] ـ خوایا! رۆژی شەمۆ و پێنج شەمۆ ودم و خێرت بنێرە سەر ئۆمەتەکەمدا.

گرانم لەسەر دانەنای».

دەبێ ئەو بارەی کە بڕیارە لەسەر ولاخەکەی دابنێ، بە خێوی چارەوێکەی پیشان بدا و پتر لەوەی لەسەر دانەنێ و خودانی ئەو ولاخەش پێی رەزابێ. «ئیبنولموبارەک» سواری ولاخی بوو، یەکێک نامەیەکی پێدا کە بیداتە دەستی کەسێک. لێی نەسەند و گوتی: «ئەمەم بە خودانی چارەوێکە نەگوتووە» و بە قسەی مەلایان پاکانەی نەکرد و نەیگوت ئەمە هیچ قورساییەکی نییە و هەڵگرتنی هیچ گوناحی نییە.

**حەوتەم** - عایشە دەڵێ کاتێ پێغەمبەر بۆ سەفەر دەڕۆیشت، شانەو ئاوێنە و مسواک و کلە و نینۆک‌گری دەگەڵ خۆ دەبرد. سۆفییەکان گورێس و دۆڵچەیان لێ زیاد کرد. پێشوونان دۆڵچە و گورێسیان لەگەڵ خۆ نەدەبرد، چونکە لەهەر کوێ بان، تەیەمۆمیان دەکرد و بۆ ئاودەست، بەردیان بە کار دەهێنا و لە هەر ئاوێک کە نەیانزانیبا ناپاکە، تارەتیان دەکرد؛ هەرچەند پێشوونان وایان نەکردووە، بەڵام سۆفییەکان بۆیان هەیە کە بەم چەشنە چاودێری کەن و چاودێری چاکە. سەفەری رابردووان بۆ خەزا و خەبات و کارگەلی گرینگ و گەورە بووە و نەیانتوانیوە بپەرژێنە سەر ئەم کارانە.

**هەشتەم** - کاتێ پێغەمبەر لە سەفەر دەگەڕایەوە و لە دوورەوە مەدینەی دەدی، دەیفەرموو «اَللّهُمَّ اجعَل لَنا بِها قَراراً وَ رِزقاً حَسَناً»[1]. پاشان پێشتر لە خۆیان کەسێکی دەنارد؛ بە یارانی گوت کە کەس گوزوگومەت نەڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی. دوو کەس لەم پەیڤەی لایاندا و لە ماڵی خۆیاندا نامۆیەکیان دی و کێشەیەکیان بۆ ساز بوو. کە گەیشتە بەرەوە، سەرەتا دەڕۆیشتە مزگەفت، دوو رەکات نوێژی دەکرد و دەیگوت: «تَوباً تَوباً لِرَبِّنا اَوباً لا یُغادِرُ عَلَینا حَوباً»[2].

سوننەتێ کە پێداگری زۆری لەسەرکراوە، دیاری هێنانە بۆ خاووخێزان. لە خەبەرەکاندا هاتووە کە ئەگەر هەر هیچتان نەهێنا، بەردی لە توورەکەتان بنێن و بیهێننەوە. ئەمە بۆ گرینگ بوونی ئەم کارە بێژراوە و ئەمانەی بێژران نەریتە رواڵەیتیەکانی سەفەربوون.

نەریتی خاسان لە دەرونیاندایە، قەد پێ لە رێی سەفەر نانێن، مەگین ئەوەی دڵنیا بن خێری دوارۆژی تیایە؛ لە رێگادا، ئەگەر کەم و کورتیەکی لە دەروونی خۆیدا بینی، پاشگەز دەبێتەوە. بڕیار دەدا لە هەرشارێ سەردانی قەبری گەورە پیاوانی ئەو شارە کا و بڕواتە سەردانی مەشایەخ و لە هەریەکیان بەهرەیەک وەربگرێ؛ نە بۆ خۆهەڵکیشان کە من فلان شێخم بینی، بەڵکم بۆ ئەوەی ئەو پەیڤەیان بکاتە چرای رێی تەنگ و تاریکی دوارۆژی. لە هیچ شارێ پتر لە دە رۆژان نەمێنێتەوە، مەگین بە هێمای رێبەرێکی رێزان. گەر بۆ سەردانی هەڤاڵێکی رۆیشت، پتر لە سێ رۆژان

---

[1] ـ پەروەرندەم! لەم شارەدا ئارامش و رزق و رۆزی فراوانمان بۆ پێک بێنە.

[2] ـ لە گوناهانمان بەرەو پەروەرندەمان پاشگەز دەبینەوەو وادەگەڕینەوە کە هیچ گوناهێکمان نەبێ.

نەمێنێتەوە، رادەی میوانی هەر ئەوەندەیە؛ مەگین ئەوەی خانەخوێکەی زۆری پێ خۆش بێ و لە نەمانەوەی ئەم، لێی زیز بێ.

کە سەردانی پیرێکی کرد، لە شەو و رۆژێ زۆرتر نەمێنێتەوە، چونکە مەبەست تەنیا سەردانە. کە رۆیشتە بەردەرکی کەسێ، سەرەتا تەقە بداو چاوەروان بێ تا خانەخوێ بێتە دەرێ. تا دوایی‌هێنانی سەردان و چاوپێکەوتن، هیچ کار نەکا و لە لای ئەو هیچ نەڵێ تا لێی نەپرسێ؛ کە لێی پرسی، بە قەدەر پرسیارەکەی پەرسڤی بداتەوە. ئەگەر ویستی شتێ بپرسێ، سەرەتا ئیزن بخوازێ. لەو شارەدا خەریکی رابواردن نەبێ، با پاک و پاراو بوونی ئەو سەردانەی لە دەست نەچێ. لە رێگادا بە نهێنی و پەنامەکی خەریکی بیرو ویری پەروەردگار بێ و قورئان بخوێنی. کە کەسێک لە گەڵی ئاخاوت، پەرسڤی ئەو بە گرینگتر لە زیکر و یادی پەروەرندەی بزانێ. ئەگەر لە ماڵی خۆیدا پەرژاوەتە سەرکارێ و ئەوەش بۆی چاترە، چاتر وایە سەفەر نەکا، چونکە پێنەزانینە بە بەرەکەتی خودا.

## بەشی دووەم - راڤەی ئەو زانستانەی کە مسافیر بەر لە سەفەر دەبێ فێر بێ

لە سەری پێویستە کە زانستی ئاسانکارییەکانی سەفەر فێر بێ -هەر چەند نەیەوێ کەڵکی لێ بگرێ- چونکە رەنگە پێویستی پێ بێ. هەروەها دەبێ زانستی دیتنەوەی قیبلە و زانینی کات فێر بێ.

لە سەفەردا بۆ تارەت کردن دوو ئیزن هەیە: یەکێک دەستی تەڕ ماڵین بە شەکالدا و ئەویتریان تەیەممۆم. لەنوێژی فەرزدا دو ئیزن هەیە: کورت و کۆ (قصر و جمع). نوێژی سوننەتیش دوو جۆرە: لەسەر چارەوێ یاخۆ لە کاتی رێگابرین بخوێنرێ. بۆ رۆژوو، یەک ئیزن هەیە، ئەوەش کردنەوەی رۆژووە. ئەم حەوت ئیزنە بۆ ئاسانکاری لە سەفەرن.

**ئیزنی یەکەم** - دەستی تەڕ هەنوون بە پێڵاودا. هەرکەس پاش ئەوەی بە تەکووزی خۆی خاوێن کرد، شەکالی کردە پێی، پاشان ویستی بڕواتە ئاودەست، دەتوانی دەستی تەڕ بە شەکالی خۆیدا بێنێ؛ لە سەفەردا تا سێ رۆژان پاش ئەو ئاودەستە، دەتوانێ وا دەسنوێژ بشوا. بەڵام کە لە شوێنێ گیرسایەوە، بۆ شەو و رۆژێ ئەم ئیزنەی هەیە؛ ئەوەش بە پێنج مەرج:

**یەکەم**، بە تەواوی تارەت بێنێ، پاشان پالای لە پێ کا؛ بە بڕوای شافیعی ئەگەر پێیەکی بشواو کەوشی بکاتە پا، رەوانییە. کەواتە پاش شۆردنی ئەو پێکەی‌تری، دەبێ پێی یەکەمی لە پێلاوی دەربێنێ و دیسان بیکاتەوە پای.

**دووەم**، دەبێ پێڵاوی جۆرێک بێ کە بتوانێ پێیەوە رێگا ببڕێ، ئەگەر چەرمی نەبوو پێی ناکرێ و ناتوانێ[1].

---

١ ـ وەکوو گۆرەوا و شتی وا.

**سێهەم** ئەوەیە کە تا گوێزینگ دەستی پێدا بێنێ. ئەگەر لە پشتی پێوە شەکاڵ کون بوو، یاخۆ شتێکی پێوە نووسابوو، بە پێی بۆچوونی شافیعی رەوانییە؛ بەلام مالک پێی وایە هەر چەند دڕابێ، هەر ئەوەی کە بکرێ پێیەوە رێگا ببڕێ، رەوایە؛ ئەم پەیڤە سەرەتا هی شافیعی بوو، بەلام دواجار گۆڕای. بە بڕوای من ئەمەیان راسترە؛ چونکە پێلاو لە ڕێی دوورو درێژدا دەدڕێ و زۆرجار ناپۆڕێ کە بیدوورنێتەوە.

**چوارەم**، پاش دەس ساوین بە پالاکەیدا، نابێ لە پێ دایکەنێ؛ کە لە پێی داکەند، چاتر وایە سەر لە نوێ دەسنوێژ بشواتەوە؛ بەلام ئەگەر تەنیا بە شۆردنی پێ قنیاتی کرد، دەلێن رەوایە.

**پێنجەم**، پێویست نییە دەست بە پوزەوانەیدا بکشێ، دەست کێشان بەسەر پەنجەی پێدا و بە پشتی پێدا چاترە. دەست کێشان بە قامکێکیش رەوایە، بەلام بە سێ قامک چاترە. پتر لە جارێکیش دەست بەسەر پێیدا نەمالێ. ئەگەر بەر لە کەوتنەڕێ دەستی بەسەر پێیدا کێشا، تا شەو و ڕۆژێک بۆی بەستە. سوننەت وایە کە بەر لە کەوش کردنە پا، پێلاوەکان داتەکێنرێن و بەرەوخوار داوەشێنرێن، چونکە جارێک پێغەمبەر ویستی پێلاو لە پێ کا. تایەکیانی کردە پێ، ویستی ئەو تاکەیتر کاتە پێ، لەپڕونەکاو قالاوێک کەوشەکەی ڕفاندو لەو لای‌ترەوە بەری دایەوە. کە سەیریان کرد، مارێکی تێدا هاتەدەر. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی بە خودا و ڕۆژی پەسلان بڕوای هەیە، با بەر لە پێلاو کردنە پێ، پێلاوەکەی سەرەونخورن راشەکێنێ».

**ئیزنی دووەم**، تەیەمۆمە. ئەم بەشە لە باسی تارەتدا بە وردی بێژراوە و با دووپاتە نەکرێتەوە.

**ئیزنی سێهەم**، ئەو فەرزانەی چوار رەکاتن، بە دوو رەکات بخوێنرێن، بەلام بە چوار مەرج:

**یەکەم**، لە کاتی خۆیدا بیخوێنێ؛ گەر وە درەنگ کەوت، رەوانیە بە کورتی بیخوێنێ.

**دووەم**، دەبێ بلێت کە نیازی کورت خوێندنی هەیە (قصر). ئەگەر گوتی کە نیازی نوێژی تەواوی هەیە، یا لە بیری نەما کە گوتوویە تەمای نوێژی تەواوی هەیە یا کورت، دەبێ ئەو نوێژەی بە تەواوی بخوێنێ.

**سێهەم**، نابێ بە شوێن کەسێ بکەوێ کە ئەو نوێژی تەواو دەکا. ئەگەر خوێندی بە تەواوی بیخوێنێ؛ تەنانەت ئەگەر دڕدۆنگ بوو کە بەرنوێژ خەلکی ئەو شوێنەیە یا خۆ ئەویش ڕێبوارە، دەبێ نوێژەکەی بە تەواوی بخوێنێ، چونکە ڕێبوار لە خەلکی نیشتەجێ جیاناکرێنەوە.

بەلام ئەگەر بەرنوێژ ڕێبوار بوو، دەتوانێ نیازی کورت خوێندن بێنێ؛ جا ئەگەر بەرنوێژ نیازی تەواو خوێندنی بوو، زانینی ئەوە مەرج نییەو مەبەستی هەرکەس لە دلی خۆیدا شاراوەیەو بەرپیوارە.

**چوارەم**، دەبێ ئەو سەفەرە درێژ بێ و رەوا. سەفەری کۆیلەی هەلاتوو، سەفەر بۆ بڕینی ڕێگای خەلکوخوا، یاخۆ بۆ بەدەست هێنانی مالی ناڕەوا، یاخۆ بەبێ ئیزنی دایک و باوک ڕۆیشتن بۆ سەفەر،

حەرامە و ئەم ئاسانکاریانەی بۆ نابێ. هەروەها کەسێکیش کە لە خێوی قەرز هەڵبێ و پارەی بێ قەرزەکەی بداتەوە، کەچی نەیداتەوە. بەگشتی، هەر سەفەرێک بۆ مەبەستێکە و ئەگەر مەبەستی سەفەر حەرام بێ، سەفەرەکەش نارەوایە.

سەفەری درێژ دەبێ پتر لە شازدە فرسەخ بێ؛ کەمتر لەمە نوێژی کورت رەوانییە. هەر فرسەخێ دوازدە هەزار شەقاوە. سەرەتای سەفەر، هاتنە دەر لە شارە، هەر چەن لە کەلاوەو باخ و بێستانی شار نەهاتبێتە دەر. کۆتایی سەفەر ئەوەیەکە بڕواتە نێو شار، یا ئەو شوێنەی مەبەستی بووە و سێ رۆژ یان زۆرتر بە نیاز بێ لەوێ بمێنێتەوە؛ بێجگە لە رۆژی چوونە ناو شار و هاتنەدەر لە شار. ئەگەر بە نیاز نەبێ زۆر بمێنێتەوە، کەچی جێبەجێکردنی کارەکانی درێژەی خایاند و نەیدەزانی کەی دەتوانێ بگەڕێتەوە و هەموو رۆژێ چاوەڕوانی دوایی هاتنی کارەکانی بوو و سەفەرەکەی پتر لە سێ رۆژانی خایاند، دەتوانێ لە هەموو ئەو ماوەیەدا نوێژی کورت بخوێنێ؛ چونکە بە دڵ ئوقرەی نەگرتووە و نیازی گەڕانەوەی هەیە، هەر بە مسافر دێتە هەژمار.

**ئیزنی چوارەم،** کۆ کردنەوەی نوێژی نێوەڕۆ و پاش نیوەڕۆ، نوێژی شێوان دەگەڵ نوێژی خەوتنان. لە سەفەری دوورودرێژی حەلالدا، دەتوانێ نوێژی نێوەڕۆ بخاتە درەنگان و لەگەڵ نوێژی ئێوارەدا بیخوێنێ؛ یا خۆ نوێژی ئێوارێ لەگەل نوێژی نێوەڕۆدا. نوێژی شیو و خەوتنیش هەروا.

چاتر وایە کە سوننەتەکانیش بەجێ بێنێ، تا لە خێر و بێری بێ بەش نەبێ؛ چونکە خێری سەفەر ناگاتە ئاستی فەوتاندنی نوێژی سوننەت، بەلام دەتوانێ سوننەتەکان لەسەر پشتی چارەوێ یا خۆ لە کاتی ڕێگابڕیندا بخوێنێ. دەبێ سەرەتا چوار رەکات نوێژ، کە سوننەتی نوێژی نیوەڕۆیە، بخوێنێ و پاشان چوار رەکات نوێژی سوننەتی پاش نیوەڕۆ. پاشان بانگ و قامەتی نوێژ بخوێنێ و نوێژی نیوەڕۆ بەجێبێنێ. پاشان بۆ نوێژی پاش نیوەڕۆ قامەت بخوێنێ و ئەگەر ویستی تێمۆم بگرێتەوە و نوێژی ئێوارەی بخوێنێ و نابێ مەودای هەردوو نوێژی نیوەڕۆ و پاش نیوەڕۆی پتر لە خوێندنی قامەتێک و گرتنی تێمۆمێک بێ. ئەو دوو رەکات نوێژی سوننەتەی کە دەبێ پاش نوێژی نیوەڕۆ بخوێنری، پاش نوێژی ئێوارێ بە جێی بێنێ. ئەگەر نوێژی نیوەڕۆی خستە دواوە، لە کاتی نوێژی ئێوارەدا هەروابکات. ئەگەر نوێژی پاش نیوەڕۆی بەجێهێناو بەر لە ئاوابوونی خۆر گەیشتە نێو شار، پێویست ناکات نوێژی ئێوارەی بخوێنێتەوە. نوێژی شێوان و خەوتنانیش هەروایە. بە گوێرەی پەیڤێک نوێژی کۆ لە سەفەری کورتیشدا رەوایە.

**ئیزنی پێنجەم،** خوێندنی سوننەت لە سەرپشتی چاروادا رەوایە. مەرج نییە کە رووی لە قیبلە بێ، رووی ڕێگا خۆی بە جێێ قیبلەیە؛ ئەگەر بە قەستی رووی ڕێگای بەرەو شوێنیتر بگێرێتەوە و ئەو لایەنەش قیبلە نەبێ، نوێژەکەی بەتاڵە؛ ئەگەر هەڵەی کرد، یاخۆ چارواکەی سڵی کرد، هیچ زیانی نییە. چەمانەوەو کڕنۆشی بە چاو بێ و نەختێ خۆی کۆم کاتەوەو بۆ کڕنۆش نەختێ زۆرتر

بچەمێتەوە. نابێ ئەوەندە خۆی بچەمێنێتەوە کە بکەوێتە خوار. ئەگەر لە نێو کەژاوەدا بوو، دەبێ بە تەواوی بچەمێتەوە.

**ئیزنی شەشەم**، دەتوانێ لە کاتی سوادەشدا[1] نوێژی سوننەت بە جێ بێنێ. سەرەتا کاتی گوتنی «اَللّٰهُ اَکْبَر» رووی لە قیبلە کا، چونکە بۆ ئەم سانایە کەچی بۆ سوارە دژوارە. چەمانەوەو کرنۆشی بە هێما بەجێبێنێ و شادە و تەحیاتیش لە کاتی رۆییندا بخوێنێ و سلاوی رێگا بداتەوە. دەبێ ئاگادار بێ پێ بەسەر پیسایدا نەنێ. لە سەری پێویست نییە بە بۆنەی پیساییەوە رێگای بگۆڕێ و خۆی تووشی ئازاری زۆرکا. ئەوەی لەبەر نەیارێک هەلدێ، یا خەریکی خەزایە، یاخۆ لەبەر گورگ و سەگ هەلدێ، دەبێ فەرزی نوێژ بەجێبێنێ، چ بە سوادە و چ بە سوارە.

**ئیزنی حەوتم**، کردنەوەی رۆژووە. مسافیرێک کە نییەتی رۆژووی هێنابێ، بۆی هەیە کە بیشکێنێ. ئەگەر پاش بەیانی لە شار بێتە دەر، نابێ بیشکێنێ. ئەگەر رۆژووەکەی کردەوەو بە رۆژ گەیشتە شارێکیتر، نابێ بە رۆژ لەو شارەدا نان بخوا و ئەگەر نەیکردبێتەوەو گەیشتە شارێکیتر، نابێ رۆژووەکەی بکاتەوە. کورت خوێندنی نوێژ لە سەفەردا هێژاترە لە تەواو خوێندنی، تا لە لێلی و دڕدۆنگی دەربێ. بە پێی بڕوای ئیمام ئەبووحەنیفە تەواو خوێندنی نوێژ رەوانییە.

بەلام بە رۆژووبوون هێژاترە، تا تووشی قەزا نەیێ، مەگەر لە خۆی دلنیا نەبێ کە بتوانێ رۆژووەکەی تا سەربگرێ.

لەم حەوت ئیزنە، سێیان بۆ سەفەری دوورودرێژە: نوێژی کورت و کردنەوەی رۆژوو و دەست ساوین بەسەر پێلاودا بۆ ماوەی سێ رۆژان؛ سێ ئیزنی بۆ سەفەری کورتە: خوێندنی نوێژی سوننەت بە سوارە یا خۆ سوادە، نە خوێندنی نوێژی هەینی، تێمۆم بە بێ قەزای نوێژ. بەلام بۆ کۆ کردنەوەی نوێژ لە سەفەری دوورو کورتدا را و بۆچوونی جیاواز هەیە.

ئەوەی تەمای سەفەری هەیە، دەبێ سەرەتا ئەم زانستانە فێر بێ، چونکە لە رێگادا رەنگە کەس نەبێ بۆی روون کاتەوە. هەروەها دەبێ بتوانێ قیبلە ببینێتەوە و کاتی نوێژیش بزانێ، چونکە رەنگە رێی نەکەوێتە گوند و شارێک و لێی ئاشکرا نەبێ. دەبێ ئاستەکانی هەتاو بۆ خوێندنی نوێژی نیوەڕۆ و پاش نیوەڕۆ و ئێوارە بزانێ، هەروەها جەمسەرەکان بزانێ و ئەگەر لە کێوێکدا بوو، بزانێ قیبلە دەکەوێتە کام لایەوە؛ زانینی ئەمانەی لەسەر پێویستە.

---

[1] - سوادە: کەسێک بە پێیان رێگا ببڕێ.

## بنەمای هەشتەم - نەریتەکانی هەلەکەسەمای دەروێشان

دەستوورەکانی سەما کردن لە دوو پاژدا راڤە دەکەین:

### پاژی یەکەم - باس لەسەر رەوا بوونی هەڵەکەسەما و بابەتە حەلاڵ و حەرامەکانی

پەروەدگار، نهێنیەکی لە دڵی مرۆڤدا حەشار داوە کە وەکوو ئاور لە ئاسندا بەرپیوارە. هەر وەکوو چۆن کاتێ بەردێ بەسەر ئاسنێکدا دەدا، ئاوری شراوەی نێو دڵی ئاسن ئاشکرا دەبێ و خۆی دەنوێنێ، دەنگی خۆش و جوان، دڵ دەبزوێنێ و ئەو نهێنیەی کە لە دڵدایە خۆی دەنوێنێ و بەبێ ئەوەی مرۆڤ لە هۆکەی تێبگا، خۆی ئاشکرا دەکا.

هۆی ئەم دۆخە پێوەندییەکە کە گەوهەری مرۆڤ دەگەڵ عالەمی سەروو هەیەتی. جیهانی سەروو، جیهانی جوانی و گونجاوییە؛ بنەمای جوانی لەسەر تەکووزییەو هەرچی تەکووزی ئەم جیهانەیە، نوێنەری جوانی جیهانی سەروون. هەر لەباری و جوانی و تەکویزییەک کە لەم جیهانەدایە، بەرهەمی جوانی و دەلالی و تەکووزی ئەو جیهانەیە.

کەواتە دەنگی خۆش و رێک‌وپێک، نوێنەری جوانیەکانی عالەمی سەرووە، چونکە تەلی گیانی مرۆ دەبزوێنێ و حەز و تاسەیەک بەدی دێنێ کە مرۆڤ خۆشی سەری لێ دەرناکا. ئەم کاریگەرییە بەسەر دڵێکی سادە و ساکار و بێخەوشایە، کە هیچ گراوی و تاسەیەکی بۆ نەهاتبێتە دی. بەلام کە دڵ تووش هات، بە بیستنی ئەو دەنگە خۆشە، وەکوو فوو بکەی بە ئاوردا، ئاوری دەروون کڵپە دەوەشنێ.

هەرکەس ئاوری خۆشەویستی پەروەرندەی لە دڵدا بێ، دەنگی خۆش زۆرتر بە سەریدا کاریگەر دەبێ و زۆرتر ئاگری دڵی دەگەیشێنێتەوە. ئەوەش دڵی رمووەدەی شتی بێهۆ بێ، دەنگی خۆش وەکوو ژاری کوشندەیەو حەرامە بۆی.

زانایان لەسەر حەرام یا خۆ حەلاڵ بوونی گۆرانی رایان جیاوازە. ئەوەی دەڵێ حەرامە، لە دۆستی و خۆشەویستی پەروەردگار بێبەهرەیە و دڵی لەو تاسەیە کپ و کەڕ و کوێرە. چونکە پێی وایە کە مرۆڤ ئەوەی لە ماکی خۆی و لە چەشنی خۆی بێ، خۆشی دەوێ و چۆن دەتوانێ شتێکی‌تر، لە ماک و جۆرێکی‌تری خۆش بوێ؟ کەواتە، لە لای ئەو، دڵ بێجگە لە مرۆڤی‌تر، گیروودەی چیدی نابێ و ئەگەر خۆشەویستی پەوەرندەی لە دڵێکدا بێتە دی، بێجگە لە خەیاڵێکی خاو چیتر نییە. کەواتە دەڵێ گۆرانی و سەما، یان یارییە و یاخۆ هی ئەڤینی دونیاییەو ئەم دوانەش حەرام و سهێتن.

ئەگەر لێی بێرسن «واتای ئەم پەیڤە کە دەڵێ خۆشەویستی پەروەردگار لە سەرخەڵکی پێویستە، چییە؟» دەڵێ: «گوێڕایەڵی و بەندەگی». ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە کە ئەم تاقمە تووشی هاتوون. لە کتێبی خۆشەویستی بەشی «مُنجیات» دا بەوردی ئەم باسە لێکدەدەینەوە.

بەڵام دەبێ بزانین رەوا و نارەوابوونی گۆرانی و سەما، بە گوێرەی دڵە؛ چونکە سەما بۆ خۆی هیچ شتێ لە دڵدا بەدی‌ناهێنێ، بەڵکوو ئەوەی کە لە دڵدایە دەبزوێنێ. ئەوەی لە دڵدا ئەڤینێکی راستی بێ -کە لە لای دینەوە پەسندکراوە، هێز و وزەی سەلمێندراوە- و بە سەما ببووژێتەوەو بگەشێتەوە، خێرووەمی زۆروزەوەندەیە. ئەوەش گراوی شتی پووچەڵ بێ -کە دین بە کرێتی دەزانێ- سەما و هەڵەکە بۆی زیانی هەیە. بەڵام ئەوەی دڵی لە هەر ئەڤینێک بۆش بێ و تەنیا بە مەبەستی یاری و رابواردن چێژی لێ ببا، بۆی رەوایە.

**کەواتە سەما سێ جۆرە:**

**جۆری یەکەم** - ئەوەی بە بێ هیچ نیازێ و تەنیا بۆ رابواردن و چێژ لێ بردن گوێی لێ بگرێ. سەرلەبەری دونیا گاڵتەو جەفەنگەو ئەمەش لە ریزی ئەوانە. هەروەها نابەجێیە ئەگەر بڵێین گۆرانی حەرامە، چونکە خۆشە؛ راستیەکەی ئەوەیە کە هەموو خۆشییەک حەرام نییە. ئەو خۆشیانەی کە بە حەرام ناوبراون، حەرامییەکەیان لە سۆنگەی خۆش بوونیانەوە نییە، بەڵکوو بە بۆنەی زیان و خەسارێکە کە تێیاندایە. چونکە دەنگی مەل و پەلەوەران خۆشە و هیچ حەرام نییە، دەرودەشت و چیا و گوڵ و گوڵزار گەلێک جوانە و هیچ حەرام نییە.

دەنگی خۆش بۆ گوێ، وەکی جۆگە و کانیاو و شینایییە بۆ چاو؛ هەروەها وەکوو بۆنی میسکە بۆ کەپۆ، تامی خۆشە بۆ زار و گفتی جوان و بە توێکڵ و ژیرانەیە بۆ ئاوەز. هەر یەک لەم هەستانە چێژێکیان هەیە، کەواتە بۆچی حەرام بن؟

بەڵگە بۆ ئەوەی کە سەما و یاری و گۆرانی گوتن حەرام نییە و سەیر کردنیشی رەوایە، ئەوەیە کە عایشە دەڵێ: «رۆژی جێژن، رەش پێستان لە مزگەفتدا بەزمیان بوو، پێغەمبەر پێی گوتم، پێت

خۆشە سەیریان کەی؟ گوتم: "ئەرێ". لە لاشیپانی دەرگادا ڕاوەستاو دەستی ڕاگرت تا من چەناکەمی لەسەر دانم. ئەوەندە سەیرم کرد کە چەن جار پێی گوتم: "بەس نیە؟" گوتم "نە"».

ئەم هەواڵە لە «صحیح»دا هاتووە و پێنج ئیزنی لێ خویان دەبێ:

**یەکەم** - یاری و بەزم و گۆرانی گوتن و سەیرکردنی -ئەگەر جارجار بێ- ڕەوا و حەلاڵە.

**دووەم** - لە مزگەفتدا ئەو بەزمەیان گێڕاوە.

**سێهەم** - لە خەبەردا هاتووە کە کاتێ پێغەمبەر عایشەی لەوێ بردەوە، فەرمووی: «دونَکُم یا بَنِی اَرْفِدَةَ» واتە، خەریکی یاریەکەتان بن. ئەمەش فەرمانە. کەواتە ئەگەر حەرام بایە، چۆن پێغەمبەر فەرمانی بۆ کاری حەرام دەدا.

**چوارەم** - بە عایشەی گوت «دەتەوێ سەیریان کەی؟» ئەمەش دیارە داخوازی پێغەمبەر بووە، نەک ئەوەی عایشە خۆی ڕۆیشتبێ بۆ سەیر کردن و پێغەمبەر هیچی نەگوتبێ. ئەگەر وابایە، دەکرا بلێن: «پێغەمبەر نەیویستووە دڵی عایشە بڕەنجێنێ».

**پێنجەم** - هەرچەند یاری و سەیرکردنی یاری کاری پێغەمبەر نییە، بەڵام ماوەیەکی چاکیش ڕاوەستاوە و خەریکی سەیرکردن بووە. دیارە ئیزن‌دان بە ژن و منداڵ بۆ سەیری بەزم و گۆرانی -تا دڵیان خۆش بێ- لە بەرزی ئاکارە؛ ئەمەش گەلێک هێژاترە لە دوورەپەرێزی و ناوچاو گرژی و پارێزکاری و قورئان‌خوێنی.

لە سەحیح‌دا هاتووە کە عایشە دەڵێ: منداڵ بووم، بووکە شووشەیەکم ڕازاندبووەوە -وەکوو هەموو کێژۆلەیەک- چەن منداڵی‌تر هاتنە لام. کە پێغەمبەر هات ئەو کچانە هەڵاتن و ڕۆیین. پێغەمبەر بۆ لای منی ناردنەوە. ڕۆژێک بە کچۆلەیەکی گوت: «ئەم بووکانە چین؟» گوتی: «کچەکانمن». گوتی: «ئەمە چییە لێرەدا بەستۆتەوە؟» گوتی «ئەسپە». گوتی: «ئەمە چییە بەسەر ئەم ئەسپەدا بەسراو؟» گوتی: «پەڕوباڵی ئەسپەکەیە». گوتی: «ئەسپ کەی پەڕوباڵی هەیە؟» گوتی: «مەگەر نەتبیستووە سولەیمان ئەسپێکی باڵداری بووە؟» پێغەمبەر بزەیەک گرتی بە جۆرێک کە دانەکانی دیار بوون».

بۆیە ئەم باسەم گێڕاوە تا ئاشکرا بێ کە قورئان خوێندن و ڕووگرژ کردن و مۆن‌بوون و خۆ لەم کارانە بواردن، دینداری نییە؛ بە تایبەت لەگەڵ منداڵ و ئەوکەسانەی کە بە گوێرەی خۆیان کارێک دەکەن. هەروەها ئەم هەواڵە بەڵگە نییە بۆ ئەوەی کە چێ‌کردنی ڕوومەتی مرۆڤ و گیاندارانی تر ڕەوایە؛ چونکە وەویلەی دەستی منداڵان لە چێو و قوماشە و ڕوومەتی تەواوی نییە، باڵی ئەسپەکەش لە قوماش بووە.

عایشە دەڵێ: «ڕۆژی جێژن بوو، دوو کچ لە لام بوون، دەفیان لێ دەدا و گۆرانییان دەخوێند. پێغەمبەر گەڕایەوە و لەسەر پێخەفی ڕاکشاو ڕووی وەرگێڕا. ئەبووبەکر هاتە ژوورێ، لۆمەی کردن و

گوتی: "لە ماڵی پێغەمبەردا بەزمی شێتانە دەگێڕن؟" پێغەمبەر فەرمووی: "ئەبووبەکر! وازیان لێبێنە، رۆژی جێژنە"». بەم خەبەرەش روون دەبێتەوە کە دەفژەندن و گۆرانی خوێندن رەوایە. بێشک پێغەمبەر گوێی لە دەنگی ئەو بەزمە بووە و ئەوەی کە بەرگری لە ئەبووبەکر کردووە، بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ رەوا بوونی.

**جۆری دووەم**- ئەوەی لە دڵدا گراوی شتەکی نالەبار بێ، وەکوو ئەوەی کەسێک گیرۆدەی ئەوینی ژن یا منداڵێ بێ و سەما و هەڵپەڕکێی ئەو کەسە مەیل و تاسەی ژوانی بۆ زۆرتر کا، یا خۆ گوێی لە گۆرانیەک بێ کە باسی خاڵ و ئەبرۆ و چاو و پەرچەم کا و لە دڵی خۆیدا ئەو کەسە تەیار کا و پێی وا بێ پەسنی گراوەکەی خۆیە و ئەمانەش حەرامن. زۆربەی جحێڵان هەروان و بۆ دامراندنی ئاوری ئەڤینی پووچەڵ، دووری لەم بەزمە پێویستە. بەڵام ئەگەر ئەو بەزم و پەیڤانە خۆشەویستی ژن یا کارەکەری خۆی لە دڵیدا زۆرتر کا، ئەمە لە ریزی چێژەکانی دونیایە و رەوایە؛ تا ئەو کاتەی یا ژنەکەی تەڵاق بدا، یا خۆ کارەکەرەکەی بفرۆشێ، ئەوسا لێی حەرامن.

**جۆری سێهەم** – ئەوەیە کە لە دڵدا تایبەتمەندییەکی هێژای بێ و ئەو دانستەیە بە گۆرانی ببزوێتەوەو گەشە بستێنێ و ئەمەش چوار جۆرە:

**یەکەم**، گۆرانی و شیعری حاجیانە کە لە پەسنی ساراو کەعبەدا دەیڵێن و ئاوری تاسەی ماڵی خودایان لە دڵدا دەگەشێنێتەوە. گوتنی ئەم شیعر و گۆرانیانە خێر و پاداشی زۆری هەیە بۆ ئەو کەسەی نیازی رۆیشتن بۆ حەجی هەیە. بەڵام ئەگەر کەسێک دایک و بابی هەیە کە ئیزنی رۆیینی پێ نادەن، یا خۆ رۆیین بۆ حەجی پێ ناکرێ، گوێگرتن یا خۆ گوتنی ئەم گۆرانی و شیعرانەی بۆ رەوا نییە تاکوو پاپای فرەتر نەبێ؛ مەگین ئەوەی دڵنیا بێ هەرچەن دڵی تەژی لە تاسە بێ، دەتوانێ خۆ بگرێ و نەڕوا. گۆرانی و شیعری خەزاکەرانیش کە دنەی خەڵک دەدەن تا بەرەنگاری کافران بن، هەر بەم چەشنەیە و خێر و پاداشی زۆرە. هەروەها لە کاتی شەڕدا گوێ گرتن لەو گۆرانیانەی مێرخاسی خەزاکەر پتر دەکەن بۆ شەڕ کردن، پاداشی هەیە؛ بەڵام ئەگەر ئەو شەڕە بە جێی کافران لەگەل برواداران بێ، ئەو گوێ گرتنەش سزای هەیە.

**دووهەم** – سەروە و سەردولکەیە[1] کە دەبێتە هۆی گریان و دڵخەمین کردن. ئەمەش خێر و پاداشی هەیە، چونکە بیر لە گوناح و هەڵەو کورتیەکان و ئەو هەڵانەی لە دەستی داون دەکاتەوە و

---

[1] - سەروە: نوحە   سەردولکە: نوحە.

ئەمانەش هەمووی هۆی ڕەزامەندی پەروەردگارن؛ هەروەکوو سەروەکانی داوود کە ئەوەندەی بیری هەڵە و گوناح و دواڕۆژ لە دڵدا پێک دێنا، تەرمیان لە کۆڕەکەیدا هەڵدەگرت؛ چونکە دەنگێکی ئێجگار خۆش و خەمینی بوو. بەڵام دولکە بۆ خەمێکی حەرام، حەرامە. وەکوو شین و شەپۆڕ و لاواندنەوەی مردوو؛ چونکە خودا فەرمووی لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا ءَاتَىٰكُمْ[1] واتە بۆ شتی لە دەست چوو خەم مەخۆن. ئەوەی ڕەزای خودا پێ ناخۆش بێ و شتی لە دەسچوو بلاوێنێتەوە و ئەو دەرد و خەمەی پترکا، گوناحبار دەبێ. لەم سۆنگەوە مزی چەمەرگێڕ حەرامە و خۆشی گوناحبارە و ئەوەش بێژنەفێ هەرتاوانبارە.

**سێهەم** - ئەوەی کە لە دڵدا شادییەکی بێ و بیستنی گۆرانی ئەو شادییە پترکا. ئەمەش ڕەوایە، چونکە شادبوونە بە شتێکی ڕەوا؛ وەکوو گۆڤەند و میوانی و حەوتانەو هاتنە دونیای منداڵ و خەتەنە سووران و گەڕانەوە لە سەفەر، هەر وەکوو پێغەمبەر دەگەڕایەوە بۆ مەدینە، خەڵکی شار دەرۆیشتنە پێشوازی و دەفیان لێ دەدا و شادییان دەکرد و گۆرانیان دەگوت و دەیانگوت:

طلعَ البَدرُ عَلينا من ثنياتِ الوَداع      وَجَبَ الشُكرُ عَلينا ما دَعا للّهِ داع[2]

هەروەها لە ڕۆژانی جێژندا شادی و هەڵپەڕکێ ڕەوایە. هەروەها لە کاتی کۆوەبوونی یاراندا کە دەیانەوێ خۆشی ڕابوێرن، سەما و هەڵپەڕکێ و گۆرانی و شادی ڕەوایە.

**جۆری چوارەم** - کە سەرەکیترینیانە، زاڵبوونی خۆشەویستی پەروەردگارە بەسەر دڵی بەندەدا.

سەما بۆ ئەم کەسە گەلێک گرینگە؛ تەنانەت ڕەنگە کاریگەری دەنگ و گۆرانی خۆش لە زۆربەی خێر و سەدەقەکان زۆرتر بێ. هەرچی ئەڤینی پەروەردگار لە دڵدا زۆتر کا، پاداشی زۆرترە. سەمای دەروێشان لەم سۆنگەوە هاتۆتەدی؛ هەرچەند ئێستا لەگەڵ گزی و فزی تێکەڵاوە و ئەمەش بە بۆنەی کەسانێکە کە بێجگە لە ڕواڵەت لە چیدی نەگەیشتوون و دەروونیان لە هەرچی واتا و ناوەڕۆکە بێبەشە. سەما و گۆرانی بۆ هەڵکردنی ئاگری دۆستی و ئەڤینی خودا زۆر کاریگەرە. کەسی وا هەیە لە نێو دەروێشاندا کە لە کاتی سەمادا ئەزموونی ئەڤینی وای بۆ دێتە ئاراوە کە لە کاتی ئاساییدا پێی ناگاو شتی وای لێ خویان دەبێ کە لە کاتیتردا تێی ناگا.

لە سۆنگەی سەما و هەڵەکەدا دالغە و خەیاڵ و ئەحواڵێک لە جیهانی بەرپیوار و نادیارەوە بە دڵ ڕادەگا، کە پێی دەڵێن «وجد». زۆرجار دڵی سەماکەر بە چەشنی زیوی لە ئاور خراو سپی و بێخەوش دەبێ؛ ئاوری سەما کاتێ لە دڵ بەر دەبێ، چ خەوش و ڕەشی هەیە، دەیسووتێنێ و پاک و

---

[1] ـ قورئان ؛ ٢٣/٥٧. هەتا ئێوە بۆ شتێ لە دەستوو دەچێ، خەم نەخۆن و بە دەسکەوتوو دڵخۆش نەبن. (هـ)

[2] ـ مانگی چاردە لە سەر ملەی «وداع»ەوە سەری هەڵدا، شوکرانە بژێری لە سەرمانە کە خودا پەرسقی نزای داینەوە.

خاوێنی دەکا، بە چەشنێک کە چاودێری و کۆشەوەیەکی زۆر و بەردەوام قەد پێی ناگا. هەڵەکەوسەما، ئەو شتە پەنامەکییەی کە هۆی پێوەندی گیانی مرۆڤە دەگەڵ جیهانی سەروو، دەبزوێنێ و بە تەواوی لەم جیهانەی دەڕفێنێ و لە هەرچی هی ئەم دونیایەیە، نامۆی دەکا و لە هەرچی ڕووداوە بێ ئاگای دەکا. تەنانەت ڕەنگە هێز و خوستی لێ ببڕێ و ببورێتەوە و بێ هێز داکەوێ.

ئەوەی لەم بارودۆخەدا بەڕاستی بەشێکی پێ‌گەیشتبێ، ئاستێکی ئێجگار بەرزی هەیە و ئەوەش باوەڕی پێ بێ، لە خێرو ودمی بەری نابێ. بەلام زۆر کەس لەم بابەتەدا بە هەڵەچوون؛ ڕاست و ناڕاست بوونی ئەوەش، تەنیا پیرانی ڕێزان دەیزانن و بەس.

خواجە عەلی حەللاج یەکێک بوو لە موریدەکانی خواجە ئەبولقاسمی گورگانی. ئیزنی سەمای خواست. گوتی: «سێ ڕۆژان هیچ مەخۆ، پاش ئەوە بلێ خواردنێکی چاکت بۆ لێ نێن؛ ئەگەر پتر لەو خواردنە حەزت لە سەما بوو، ئەوسا مەیلت ڕاست و بێخەوشە و دەتوانی سەماکەی». بەلام ئەو موریدەی کە هێشتا حالی بۆ پێک نەهاتبێ و لە ڕێگای دڵ ڕانەهاتبێ و شاوەتی لە کۆڵ نەکەوتبێ، زیانی سەما لە سوودی بۆی فرەترەو پیری دەبێ بەرەنگاری سەمای بکا.

ئەوەش سەما و وەجد و بارودۆخی سۆفییان بە درۆ بزانێ، لە بێفەڕی خۆیە و بێجگە لەوە چاری نییە؛ چونکە شتێک کە خۆی نەیدیبێ، دژوارە بتوانێ بڕوای پێ بێنێ. وەکوو نێرەمۆک کە باوەڕ ناکا لە پێوەندی ژن و پیاودا چێژو خۆشییەک هەبێ. چونکە ئەو چێژە لە سۆنگەی شاوەتە و ئەو کەسەش لە شاوەت بێوەرە، کەواتە دەبێ چۆنی بزانێ؟

ئەگەر کوێرێ حاشای چێژی کانیاو و جۆگەو ڕووبار کا، هیچ سەیر نییە. چونکە ئەو چێژە هی چاوەو ئەویش لە چاوان بێ‌بەشە. ئەگەر منداڵ حاشا لە چێژی سەرۆکی و گەورەیی و حوکمداری کا، هیچ سەیر نییە؛ چونکە منداڵێ کە بەردەوام خەریکی یاری و کایە بێ، لە حوکمداری چ دەزانێ؟

ئەوەش بزانە کە خەڵکی -زانا بن یاخۆ ڕەمەکی- لە حاشای ئەحواڵی سوفییەکاندا وەکی منداڵن کە ئەو شتەی پێیان نەگەیوە، حاشای دەکەن. ئەوەش تۆزکاڵێ تێگەیشتبێ، دانی پێدا دەنێ و دەڵێ «من بۆ خۆم ئەم حاڵەم نییە، بەلام دەزانم هەیانە».

بۆیە باوەڕی پێ دێنێ و بە ڕەوای دەزانێ. بەلام ئەوەی هەرچی خۆی نەیبێ حاشای کا و بڵێ کەس نیەسی، ئەوە ئەوپەڕی ساویلکەییە و لەو تاقمەیە کە پەروەردگار پێیان دەڵێ: وَإِذۡ لَمۡ يَهۡتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفۡكٌ[1] قَدِيمٌ.

---

١ ـ (قورئان:١١/٤٦) ئێستا کە نەیگەیشتوونێ، نێژن: ئەمە درۆیەکی کەونارایە. (هـ).

**سەرنج**

ئەو سەمای کە بە ڕەوامان زانی، بە پێنج شت دەبێتە حەرام و ناڕەوا:

**یەکەم،** بیستنی گۆرانی لە ژن یا منداڵێ کە شاوەت هەڵخرێنێ، حەرامە. چونکە ئەگەر کەسێک دڵی نوقمی بیری خودا بێ، چونکە شاوەت لە ناخی مرۆڤدا دانراوە و ڕوومەتی بەدەویش لە پێش چاوان بێ، شەیتان لە دنەدان ڕاناوەستێ و مەبەست لە سەما دەگۆڕدرێ و لەگەڵ شاوەت ئاڵ و وێر دەبێ.

بەڵام ژنەفتنی دەنگی منداڵێ کە بزوێنەری شاوەت نەبێ، حەڵاڵە. بیستنی دەنگی ئافرەتان، چ شووشەیی و جوان بێ و چ ناحەز و ڕەزاگران، ئەگەر ئافرەتەکەی لێ دیار بێ حەرامە.

ئەگەر دەنگی ئافرەتێ لە پشت پەردەوە بێتە گوێ و کەچی دیسان بزوێنەری شاوەت بێ، حەرامە و ئەگەر نە، ڕەوایە. چونکە دوو کچ لە خانووی عایشەدا گۆرانیان دەخوێند و بێ گومان پێغەمبەریش گوێی لە دەنگیان بوو، کەواتە دەنگی ئافرەتان وەکوو ڕووی منداڵان جێی شەرم نییە؛ بەڵام ڕوانینی شاوەتاوی بە منداڵ -لە شوێنێکدا کە ترسی تووشبوون بە گوناح هەبێ- حەرامە؛ ژنەوتنی دەنگی ژنانیش هەروایە. ئەمەش بە گوێرەی بارودۆخی هەرکەسە جیاوازە: کەسی وا هەیە لە خۆ ئارخەیانەو کەسی واش هەیە لە خۆ دڕدۆنگە.

ئەمەی بێژرا وەکی ئەوەیە پیاوێک لە مانگی ڕەمەزاندا خێزانەکەی راماووسێ و لە نەبزوانی شاوەتی دڵنیا بێ و ئەمەش حەڵاڵە، بەڵام گەر ترسی ئەوەی بێ شاوەتی ببزوێ، ماچی حەڵاڵی خۆی بۆ حەرامە.

**دووەم،** گۆرانیەک کە لەگەڵ ڕەباب و چەنگ و بەربەت و بەگشتی سازە ژێییەکاندا هاوڕێ بێ، یا خۆ شمشاڵی عەراقی، حەرامە. چونکە لە سازی ژێیی نەهی کراوە، نە بەو بۆنەوە کە دەنگیان خۆشە، بەڵکوو لەو سۆنگەوە کە ئەم سازانە لە کۆڕی خواردنەوەدا دەژەنرێن و ژنەفتنی دەنگیان ئەو کۆڕانە دێنێتەوە وێر و پاپای خواردنەوە دەبزوێنن.

بەڵام تەپڵ و دەف و تاس - هەر چەند ئاڵقەو زڕزڕەیان هەیە - حەرام نین؛ لەم بارەدا هیچ خەبەرێک نەهاتووە. ئەم سازانە وەکوو سازە ژێدارەکان نین و کۆڕی خواردنەوە ناخەنە بیر و لەگەڵ ئەوانە هەڵناسەنگێندرێن. تەنانەت لە لای پێغەمبەر دەفیان ژەندووە و فەرموویە لە شاییدا لێی بدەن؛ بە زیادکردنی ئاڵقەو زڕزڕەش حەرام نابێ. لێدانی تەپڵی حاجی و خەزاکەران ڕەسم و سوونەتە. بەڵام تەپڵی ئێرەمۆکان[1] حەرامە. ئەوەش تەپڵێکی درێژی ناوقەدباریکی دوو سەرپانە.

---

١ - ئێرەمۆک: نەنێر نەمێ.

**سێهەم** - گۆرانییەک کە تێیدا جنێو یا خۆ هەجوو، یا تانە و پلار لە گەورەکانی دین بێ -وەکوو شیعری شیعەکان کە بۆ سووکایەتی بە یارانی پێغەمبەر دەیلێن- یاخۆ هەڵگوتن بە ژنانی ناودارددا. چونکە هەڵگوتن بە ژناندا لە لای پیاوان نارەوایە. هۆنینەوەو ژنەفتنی ئەم شیعرانە حەرامن.

بەڵام شیعری پەسنی خاڵ و زولف و پەرچەم و چاو و برۆ و جوانی و باسی جیایی و دابڕان و پێکگەیشتن و ئەوەی پەیڤی ئەڤیندارانەیە، هۆنینەوەو بیستنی حەرام نییە. حەرام ئەوەیە کەسێک ئەو پەسنانە بۆ ژن یا خۆ منداڵێ بیر لێ کاتەوەو بەو بیرە شاوەتی ببزوێ. بەڵام ئەگەر بە یادی ژن و کارەکەری خۆی بیلێ یا خۆ بیبیسێ، رەوایە.

بەڵام سۆفی و خواناسان، هەریەک لەم پەیڤانە واتایەکیتری لێ هەڵدەگرن و بەم شیعرانە دڵیان تەژی لە بیرو ئەڤینی پەروەرندەیان دەبێ و گوێگرتنیان حەلالە. ئەمانە مەبەستیان لە زولف، رەشی و تاریکی لاڕێ بوونە، لە رووناکی روومەت، رۆشنایی باوەڕەو لە پێچ و لوولی زولف جۆرەکانی دانستەکانی پەروەردگاریان بۆ دەخاتەوە بیر. هەروەکوو شاعیرێک دەڵێ:

گوتم لێکی کەمەوە سەری ئالقەی زولفت

تا کوو بە وردی یەک بە یەکی بژمێرم

پێم پێکەنی و گوتی سەری زولفەینی رەشم

ئالۆز و لوولەو تێکی دا لێم ژمارەم

لە زولف، زنجیرەی دانستەکان تێدەگاو ئەوەی بیەوێ بە هۆی ئاوەزەوە لە گەورەیی و دانستەی پەروەرندەی تێبگا، لە نێو ئەو ئالقە ئالۆزانەدا بزر دەبێ و نەتەنیا هیچی پێ نازانرێ، بەڵکوو فام و ئاوەزی خۆشی دەدۆڕێنێ و لە هیچی ناگا. کاتێ لە شیعردا باسی مەی و خواردنەوە دەکرێ، مەبەستیان مەی و شەراوی رواڵەت نییە؛ وەکوو دەڵێن:

گەر دوو هەزار دەفری مەی بپێوی

تاکوو نەیخۆیتەوە هیچی لێ نەگەیوی

مەبەستیان ئەوەیە کە کاری دین و زانینی دین، بە باس و پەیڤ و زانست، پێک نایەو دەبێ خۆت لەم زەریایە باوێژی. ئەگەر لەسەر خۆشەویستی و پارێزکاری و ئەڤینی پەروەردگار هەزاران مەن کاغەز رەش کەیتەوەو هەزاران قەڵەمی پێ بسووی، هیچت بەهرە پێ نادا تاکوو بۆ خۆت تووش نەبی. تەنانەت لەو بەیت و شیعرانەی لە مەیخاناندا دەیهۆننەوە، واتای تر هەڵدەکرن.

وەکوو دەڵێن:

ئەوەی نەڕواتە خەرابات بێ دینە

چونکە خەرابات بناغەی دینە

سۆفی و ڕێبگاری ڕاستەقینە لە خەرابات، کاول و وێرانکردنی لووتبەرزی و فیز و دەمارەکانی مرۆ هەڵدەگرێ، کە تا مرۆ خۆی نەشکێنێ، گەوهەری مرۆڤایەتی وەدەر ناکەوێ و ڕێگای بەختەوەری لێی خویان نابێ.

ڕاڤەی ئەم باسە دوورو درێژە و هەرکەس بە گوێرەی فامی خۆی لێی دەگا؛ بەڵام هۆی گوتنی ئەم باسە ئەوە بوو کە تاقمێ گێلی هیچ نەزان پلار دەگرنە ئەم کەسانەو دەڵێن «ئەمانە باسی ژن و ئەگریجە و خاڵ و برۆ و چاوی جوان و مەستی و مەیخانە دەکەن و دەبیسن و ئەمانەش حەرامن»؛ پێیان وایە کەلێنێکی گەورەیان دیوەتەوە و تەگەرەیان تێخستووە، کەچی نەزانی خۆیان سەلماندووە.

زۆرجار ئەمانە هیچ گوێ بە واتای بەیتەکان نادەن، بەڵکوو کێشی شیعرەکان گیانیان دەبزوێنێ و وەکوو ئەوەی کەسێک گوێی لە دەف و شمشاڵ بێ، کە هیچ ناڵێ، بەڵام نەوایەکی خۆشی لێ دەردێ. بەم بۆنەیە کە زۆر کەسان کە لە تات ناگەن، بەیتی عارەبی گوێ دەدەن. هەندێ گێلی نەزانیش قەشمەرییان پێ دەکەن و دەڵێن «تۆ کە عارەبی نازانی، بۆ گوێ لەم گۆرانییە دەگری؟» ئەمانە نازانن کە حوشتریش عارەبی نازانێ، کەچی کاتی ماندوویەتی کە حوشتروان بە دەنگی خۆش گۆرانی عارەبی بۆ دەخوێنێ، وای دەبزوێنێ کە بە باری گران و ماندوویەتی زۆر، لە بیاواندا غار دەکا، کە دەگاتە بەرەوە زۆر جار دەکەوێ و هەندێ جاریش هەڵناسێتەوە. ئەم گێلانە دەبێ لەگەڵ حوشتر شەڕکەن و بڵێن «تۆ کە عارەبی نازانی، بۆچ وا دەکەویتە هەڵەکەسەما و هەڵدێی؟»

ڕەنگە لەو گۆانیە عارەبییەش شتێک بێجگە لەواتای شیعرەکانی بۆی بێتەدی و بە خەیاڵیدا تێپەڕێ. چونکە مەبەستی ئەم کەسانە شرۆڤەی شیعر نییە. یەکێک دەیگوت: «ما زارَنِی فِی النَّوم الاّ خیالُکُم[1]»؛ سۆفییەک زۆری حەز لێکرد. گوتیان: «بۆچ کەوتیتە سەما، تۆ کە هیچ لە عارەبی ناگەی؟» گوتی: «چۆن تێنەگەیشتم؛ دەڵێ "ئێمە زارین" و ڕاستیش دەکا، چونکە هەمووماں زار و پەرێشان و داماوین».

کەواتە ڕەنگە سەمایان وابێ. ئەوەی دڵی گراوی شتێک بوو، هەرچی ببینێ و هەرچی ببیسێ، دەنگ و ڕەنگی گراوەکەی دێنێتەوە یاد. ئەوەش ئاوری ئەڤینی بەرنەبووبێتە گیان ـ چ دینی یا خۆ دونیایی ـ لەم پەیڤە هیچ ناگا.

**چوارەم**، بیسەر گەنج بێ و شاوەتی بە سەردا زاڵ بێ و هیچ لە خۆشەویستی پەروەرندەی نەگەیشتبێ. ئاوەها کەسێک کە باسی خاڵ و چاو و برۆ و زلفی بۆ دەکرێ، شەیتانی لە ئەستۆ سوار دەبێ و خەیاڵی زەری و دەلالی لە دڵ پێک دێ. کاتێ گوێ بۆ ئەو پەیڤە ئەویندارانە ڕادەگرێ،

---

[1] ـ لە خەوندا بێجگە خەیالت هیچ یارم نییە.

تامازرۆی دەبێ و ئارەزووی دەبزوێ و بۆ پێگەیشتنی هان دەدا. زۆرن ژن و پیاوانێ کە بەرگی سۆفی دەبەردەکەن و بە چاوڕاو و شاتوشووت پاکانەی کارەکانیان دەکەن و دەڵێن: «فلان‌کەس، سەوداسەر بووەو ورد و زیخێ کەوتۆتە سەر ڕێی»؛ یا خۆ دەڵێن: «ئەوین داوی خودایە و فلان‌کەس کەوتۆتە داوی خودا»؛ یان «دڵدانەوەو چاودێری‌کردنی تا ئەوەی بۆی پێک بێ گراوەکەی ببینێ، خیرێکی ئێجگار گەورەیە».

گەووادی، بە ئاکاربەرزی دەزانن و داوێن‌پیسی و هەتیوبازی بە ئەوین و سەودای خودایی باس دەکەن و دەڵێن: «فلان پیری مە، لووسکەیەکی لە بەرچاو بوو؛ ئەمەش دێتە سەر ڕێی هەموو گەورەیەک و هەتیوبازی نییە، بەڵکوو پێی دەڵێن شاهیدبازی». ئەمەش قسەی پرووپووچ و چاووڕاوە بۆ پاکانەی ئاکاری سووکیان. ئەوەی ئەم کردانە بە حەرام و ناڕەوا نەزانێ، ئەباحەتییەو ڕژاندنی خوێنی ڕەوایە.

ئەوەی لە پیران دەگێڕنەوە کە سەیری منداڵێکیان کردووە، یا درۆیە و بۆ پاکانەی هەڵەکانی خۆیان دەیلێن، یاخۆ بەبێ‌شاوەت سەیریان کردووە، وەکوو سەیرکردنی گوڵێکی جوان، یا سێوێکی سوور؛ یاخۆ ڕەنگە ئەو پیرە تووشی هەڵەیەک هاتبێ، چونکە لە گوناح بێوەر نییە و بە گوناح‌کردنی ئەو، ئەو گوناحە حەلاڵ نابن.

چیرۆکی حەزرەتی داوودیان بۆیە گێڕاوەتەوە تا بزانی گوناح هەرچەن بچووک بێ و پیاو هەرچەن مەزن، چاو لە گوناحی ناپۆشرێ. ئەوەش لاواندنەوەو گریانی بوو و پاش ئەوە پاشگەزبوونەوە و تکای بۆ لێ‌خۆش بوونی لە لای پەروەردگار، تا چاوی لێ کەی و بزانی، گوناح هەر گوناحە، چ بچووک و چ گەورە.

هۆیەکی‌تریش هەیە -هەرچەن زۆر دەگمەن- ئەوەش ئەوەیە کە کەسی وا هەیە کە لەو دۆخەی سۆفییان هەن، دونیایەکی‌تری پێ دەنوێنرێ. لەو دونیایە، ڕەنگە گەوهەری فریشتەکان و گیانی پێغەمبەران لە وێنەیەکدا[1] پێی پیشان بدرێ و ئەو وێنەیەش ڕوومەتی مرۆڤێکی ئێجگار بەدەو بێ. خویانە وێنە شایانی ڕاستەقینەی واتایە؛ واتە، مانا کە لەو پەڕی جوانی و بەرزی دایە، وێنەش هەروا پیشان دەدرێ. لە نێو عارەبدا کەس لە «دحیەی کَلْبی» خوشیکتر نەبوو، پێغەمبەر جوبرەئیلی لە ڕواڵەتی ئەودا بینی. ڕەنگە یەک لەو فریشتانە لە وێنەی لاوێکی لووس و جوان‌خاسدا خۆی بنوێنێ و چێژێکی زۆری بداتێ. کە لەو دۆخە هاتەدەر، ئەو واتایەشی لێ بەرپیوار دەبێتەوەو ڕەنگە ئیدی بۆ جارێکی‌تر نەیبینێتەوە و بەردەوام تامازرۆی ئەو دیدارە بێ. جا ئەگەر هات و لە گوزوگوممەت

1 ـ وێنە: «مثال».

ڕوومەتێکی لەو چەشنەی دی، دەیخاتەوە بیر ئەو واتایەی لێ بزر بووە و تاسەی تازە دەبێتەوە و ژامی دەکولێتەوە و سەری لە سەودا تەژی دەبێ و حاڵی جارانی نوێ دەبێتەوە. کەواتە ئەوەی بۆ نوێکردنەوەی ئەو تاسەیە، سەیری ڕوومەتی جوانی کرد، بۆی ڕەوایە؛ ئەوەش لەم نهێنیانە بێئاگایە و ئەم دۆخەی لێ نامۆیە، کە ئەو پاپایە دەبینێ، پێی وایە ئەویش لەو ڕووەوە سەیری دەکا کە خۆی بۆی دەڕوانێ، چونکە لە حاڵی ئەو بێ ئاگایە. بە گشتی کاری سۆفی، کارێکی پڕ مەترسیەو گەلێکیش بەرپیوارە و هیچ شت ئەوەندەی ئەم ڕێیە، هەڵەوپەڵەی تێ ناکەوێ.

ئەم پەیڤە بۆیە بێژرا تا ئاشکرا بێ ئەم تاقمە زۆریان زوڵم لێ کراوە کە بە ناڕەوا ناویان براوە و خەڵکی لایان وایە، ئەمانەش وەکوو ئەو کەسانەن لەم ڕۆژگارەدا سەریان هەڵداوە و خەریکی گزی و فزین. لە ڕاستیدا زوڵم لێکراو ئەوانەن ئەم بیرە چەفتانە دەکەنەوە و چونکە ستەمیان لە خۆ کردووە وایان بیر لەم کەسانە کردۆتەوە، یا خۆ لەگەڵ کەسانیتریان هەڵسەنگاندووە.

**پێنجەم،** خەڵکی ڕەمەکی بۆ کەیف و ڕابواردن گوێ لە گۆرانی دەگرن، ئەمەش بۆیان ڕەوایە. بەڵام بەو مەرجەی زۆر خێی پێ نەدەن و جاربەجار بێ، نەک هەموو دەم. چونکە هەر بەو جۆرەی گوناحانی بچووک بە دووبارە کردنەوە دەبنە گوناحی گەورە، زۆر شتی حەلالیش بە دووپاتە کردنەوە، دەبنە حەرام. ڕەش‌پێستان جارێک لە مزگەفتڕا بەزم و یاریان دەگێڕا، پێغەمبەر لۆمە و بەرگری لێ نەکردن، بەڵام ئەگەر بەردەوام بایە و مزگەوتیان بکردایەتە یاریگە، بەرگری لێ دەکردن؛ هەرچەن بەرەنگاری عایشەی نەکرد بۆ سەیر کردنیان، بەڵام ئەگەر کەسێک بداتە پەیان و ببێتە پیشەی، ناڕەوایە. گاڵتە و یاری و قسەی خۆش کردن، ڕەوایە، بەڵام کە کەسێک خووی پێ بگرێ، دەبێتە قەشمەری و تیز بردنەوە و ناڕەوایە.

## بەشی دووهەم - ئاسەوار و تەریقەکانی سەما و گۆرانی

لە سەمادا سێ پلە هەیە: یەکەم تێگەیشتن، دووەم شادی، سێهەم هەڵەکەسەما. هەریەک لەمانە ڕاڤەی تایبەتی هەیە.

**پلەی یەکەم،** تێگەیشتنە. ئەگەر کەسێک بۆ ڕابواردن، یا خۆ بیری کەسێکیتر گۆرانی گوێ بدا، زۆر بچووکتر لەوەیە کە ڕاڤەی بکرێ. بەڵام ئەوەی لە بیری دین و ئەوینی پەروەردگاری بێ، ئەمە دوو ئاستە:

**ئاستی یەکەم:** ئاستی مریدە کە لە ڕێگای پڕ هەوراز و نشێویدا حاڵ و دۆخی جۆراوجۆری هەیە؛ وەکوو ئاسانی و دژواری، تەنگی و فرەهی و ئاسەواری وەرگیران و وەرنەگیران و سەرلەبەری دڵی لە ژێر کاریگەری ئەوانەیە. کاتێ پەیڤێ ببیسێ کە باسی لۆمەو دڵدانەوە، پێکگەیشتن و لێکدابڕان،

نزیکی و دووری، هۆمید و ناهۆمیدی، هێمنی و ترس، بەڵێنداری و بێبەڵێنی، شادی پێکگەیشتن و خەمی دووری و ئەوانەی وەکوو ئەم واتایەن، بە خۆی دەگرێ و ئاوری دەروونی دەگەشێتەوە و دۆخی جۆراوجۆری بۆ پێک دێ و دەکەوێتە بیری جۆراوجۆرەوە.

ئەگەر بناغەی بڕوا و زانستی پتەو نەبێ، ڕەنگە تووشی بیر و بۆچوونی کافرانە بێ. وەکوو ئەوەی ئەم بەیتەی بێتە گوێ کە دەڵێ:

لە ئەووەڵ مەیلت دامێ، ئێستە ئەو مەیلەت کوانێ؟

بۆچی لێم زیزە و ئێستە نامدوێنێ؟

هەر مریدێک کە لە سەرەتادا بارودۆخی خۆشی بووبێ و خێراتر ڕێگای بڕیبێ و کەچی لەوە بە دوا سست و کز بووبێ و لە خوست و وزەی کەم بووبێ، پێێ وایە پەروەرندەی سەرەتا مەیلی پێ داوەو هەنووکە وەرگەڕاوە؛ ئەم بیرەش لە مەڕ پەروەردگار کوفر و گوناحە. دەبێ چا بزانی کە پەروەردگار گۆڕانی بە سەردا نایەو خۆی گۆڕێنەرە نەک بگۆڕ. هەروەها دەبێ بزانێ دڵ و دەروونی ئەم گۆڕاوە، بۆیە ئەو نهێنیەی سەرەتا لیێ خویان بوو، ئێستە لیێ بەرپیوارە.

کەچی دەرگای پەروەردگار ئاوەلایە و هیچ پەردەو کوسپێکی نییە. وەکوو هەتاوە کە ڕووناکی خۆی دابەش دەکا بەسەر هەمووواندا و لە کەس دریخی ناکا، مەگین ئەو کەسەی کە لە پەنای دیوارێ خۆی حەشاردابێ و لە ڕووناکی هەتاو بێبەش کەوتبێ. بۆیە دەبێ بڵێ:

ڕۆژ هەڵاتووە ئازیز سا وەخۆکەوە

ئەگەر لێت نەدا بیری لە چارەی خۆت کەوە

دەبێ هۆی ئەو ئاستەنگ و کۆسپەی لە چارەی ڕەش و هەڵەی هێلی لاری خۆیدا ببینێتەوە نەک پەروەردگار. هۆی ئەم وێنەیە کە بێژرا ئەوە بوو کە مرید دەبێ بزانی هەرچی دانستەی چەفت و ناتەواو و بگۆڕە، دەبێ بۆ خۆی بیزانێ و هەرچی جوانی و گەورەیی و بەرزییە بۆ پەروەرندەی بزانێ. ئەگەر ئەمانە نەزانێ، تووشی کوفر و گوناح دەبێ و بەفەوتان دەچێ. بۆیە مەترسی ژنەفتنی گۆرانی بە بۆنەی خۆشەویستی پەروەردگار، گەلێک زۆرە.

**ئاستی دووهەم**، ئەو کەسەیە کە لە ئاستی مریدان تێپەڕابێ و بارودۆخە سەرەتاییەکانی بواردبێ و بەوپەڕی ئەو دۆخە گەیشتبێ کە پێێ دەڵێن توانەوە و نەمان. کاتێ کە گەڵ هەمووشتێک دەبێتە یەک، کاتێ لەگەڵ پەروەرندەی دەبێتە یەک، بێجگە لە ئەو هیچیتر و کەسیتر نابینێ و نازانێ و ناناسێ، بەم دۆخەی دەڵێن یەکیەتی و یەکبوون. سەما و دەنگی خۆش بۆ ئەم کەسە، نە بە مەبەستی تێگەیشتن لەوان، بەڵکوو بزواندن و هەژاندنی دۆخ و حاڵی بەکبوونەو لە خۆ دوور بوونەو دەگەڵ پەروەردگار یەکبوونەو تەنانەت وا لە خۆی دادەبڕێ کە ئەگەر لەپڕ بکەوێتە نێو ئاورەوە، هیچ

تیناگا و لە هیچ ناگا. هەر وەکوو شێخ ئەبولحەسەنی نووری کە لە کاتی جەزمە و سەمادا بۆ نێو قامیشەلانێ کە تازە براوبوو هەلات و پیێ کون کون بوو و زۆر بریندار بوو، کەچی خۆی هیچ ئاگای لێ نەبوو. سەمای ئاوەها کەسێک تەواوە.

بەلام سەمای مریدان، دانستەکانی مرۆڤی لەگەڵ تێکەڵە. ئەوەش ئەوەیە کە بە تەواوی لە خۆی دادەبڕێ. هەروەکوو چۆن ئەو ژنانە یووسفیان بینی و خۆیان لە بیر نەماو هەرچەند دەستی خۆیان دەبری، تێنەدەگەیشتن و نەیاندەزانی. نابێ ئەم نەمانە بە درۆ بزانی و بلێی «خۆ من دەیبینم، چۆن نەماوە؟» مەبەست لە ئەو، لاشە و جەستەی دیار نیە، هەر وەکوو چۆن کاتێ دەمرێ، بە لاشە هەیە، کەچی نەماوە. راستەقینەی مرۆڤ، ئەو واتا بە هەستەیە کە جێگای ناسین و تێگەیشتنە. کە هەموو شتێکی لێ پیوار بوو، هەموو شتێک لە حاند ئەودا نەماوە و کە لە خۆشی ئاگای برا، لە حاند خۆشیدا نەماوە و بێجگە لە یادی خودا هیچ هەر نەماوە.

کەواتە، واتای یەکەتی ئەوەیە کە چونکە بێجگە لە پەروەردگار چیدی نابینێ، دەڵێ «هەمووی هەر ئەوەو من نەماوم»، یاخۆ دەڵێ: «من پەروەردگارم». لێرەدا تاقمێ بە هەڵە وایانزانیوە ئەمە دۆنادۆنە[1]. کەچی ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە قەد ئاوێنەی نەدیبێ، کەچی جارێک ئاوێنەیەکی پێ پیشان بدرێ. کە سەیری ئاوێنە کا، خۆی ببینێ و زۆری لا سەیر بێ و وا بزانێ کە رۆیشتۆتە نێو ئاوێنەکەوە، یاخۆ وا بزانێ ئەو روومەتە، روومەتی ئاوێنەکەیە. ئەگەر پێی وابێ رۆیشتۆتە نێو ئاوێنەکەوە، ئەمە دۆنادۆنە؛ گەر وا بزانێ ئەو روومەتە، روومەتی ئاوێنەکەیە، پیێ دەڵێن یەکیەتی و هەر دووی ئەمانەش هەڵەن؛ هەرگیز روومەت ناڕواتە نێو ئاوێنەو ئاوێنەش نابێتە روومەت، کەچی وا پیشان دەدرێ. راڤەی ئەم باسە لەم پەرتووکەدا لەمە زۆرتر ناگونجێ، چونکە گەلێک دوورودرێژە.

**پلەی دووهەم** – کە لەفام و تێگەیشتن تێپەڕێ، دەڕواتە نێو دۆخێکەوە کە پێی دەڵێن شادی. واتە دۆخێک دەبینێتەوە کە پێشتر قەد نەیدیوە. لە راستەقینەی ئەم دۆخەدا پرسی زۆر هەیە.

راستیەکەی ئەوەیە کە ئەم دۆخە یەک جۆر نییە، بەڵکوو چەن جۆرە. بەلام دوو جۆری پڕ گرینگە: یەکەم لە جۆری حاڵ و دۆخ، دووهەم لە چەشنی دنیا و موکاشیفە.

**حاڵ و دۆخ** – بریتییە لەوەی کە تایبەتمەندی و دانستەیەکی بەسەر گیاندا زاڵ دەبێ، کە وەکوو مەستی وایە. ئەو دانستەیە یان تاسە و پاپایە، یاخۆ ترسە، یان ئاوری خۆشەویستییە، یاخۆ داخوازە، یان پەژارەیە و یا سوێ هاتنەوەیە. کە ئەو ئاگرە هەموو دڵ و گیانی تەنییەوە، دووکەڵ مێشک و ئاوەزی دادەگرێ و بەسەر هەموو هەستەکانیدا زاڵ دەبێ و نەدەبینێ و نەدەبیسێ، وەکوو ئەوەی

---

١ – دۆنادۆن: بڕوای ئالوگۆڕبوونی گیان لەپاش مردن؛ تناسخ.

نووستبێ؛ یا ئەگەر بتوانێ ببینێ و ببیسێ، وەکوو مەست و مەیزەدە هیچ لێی ناگا.

جۆری دووهەم، **دینراوەکانە** (مکاشفات): واتە بە گیان دیتنی ئەو شتانەی لەو پەڕی ئەم جیهانی بوونە دان؛ وەکوو ئەو شتەی بۆ سۆفییەکان دێتە دیتن؛ هەندێ بە دینا و هەندێ راشکاو. سەما بۆ ئەم کەسانە وەکوو سڕینی تۆز و گەردە لەسەر ئاوێنەیەک تا پاکژ و خاوێن بێ و بە پاراوای وێنەی تێدا بەدی بکرێ.

هەرچی بۆ شرۆڤەی ئەم دۆخە بێتە گوتن، باسێکی زانستی و دیناوی و بەراوردییە و راستەقینە تەنیا بۆ ئەوەی خۆیان دەبێ، خۆی بەو پلە گەیشتبێ. هەرکەس بە گوێرەی ئاستی خۆی و پێوەری ئەزموونی خۆی یاخۆ زانست و زانیاری خۆی لەم باسە دەدوێ و هیچ یەک لەمانەش راستەقینەی ئەم دۆخە نین، بەڵکوو باسێکی زانستین لە سەری.

بۆیە ئەم رادەیەش بێژرا، تا ئەوانەی خۆیان نەیانتوانیوە بگەن بەم ئاستە، بە درۆی نەزانن، چونکە خۆیان تووشی گوناح دەکەن. زۆر گێلە ئەوەی کە هەرچی لە توورەکەی خۆیدا نەبێ، باوەڕ نەکا لە خەزانەی خونکاریشدابێ. نەزانتر ئەو کەسەیە کە پێی وابێ خۆی پادشایە و بڵێ «من هەموو ئاستەکانم بڕیوەو هەموو شتم لێ ئاشکرا بووە، ئەوەی من نیمە، بۆ خۆشی نییە».

ئەوەی بۆ گەیشتن بەو شادییە، زۆر لە خۆی دەکا، کارەکەی دوروویە؛ مەگین ئەوەی بیەوێ بە راستی بگاتە ئەو دۆخە. لە خەبەردا هاتووە کە «کاتێ دەنگی قورئانتان بیست، بگرین، گەر پێتان نەکرا، خۆ خەمین پیشان دەن». واتە بە زۆر لە خۆ کردن، هۆکارەکانی خەم و کەسەر پێک بێنن. چونکە بۆی هەیە رێبواری رێی خوا، بگەیێنێتە مەنزڵگا.

**پرسیار:** ئەگەر یەکێک بڵێ «کە سەما راستە و بۆ پەروەردگارە، با قورئان خوێنان بێن بخوێنن، نەک گۆرانی بێژان؛ چونکە قورئان پەیڤی پەروەردگارە و بیستنی هێژاترە».

**پەرسڤ:** زۆر کەس لە گوێگرتنی قورئان، شاگەشکە بوونە، تەنانەت زۆریش گیانی خۆیان لە دەست داوە و گێڕانەوەی ئەو باسانە دوورو درێژە و لە ئەحیادا بە وردی باسی لێ کراوە، بەڵام هۆی بانگ‌کردنی گۆرانی بێژان، بە جێی قورئان خوێنان پێنج شتە:

**یەکەم،** بابەتەکانی قورئان لەگەڵ حاڵ و دۆخی ئەویندارن سازگارنیە و لە قورئان باسی جۆراوجۆر هەیە لەسەر کافر و چۆنیەتی پێوەندی موسوڵمانان لەگەڵ خەڵکی‌تر و زۆر شتی‌تر، چونکە قورئان رێنومای هەموو چین و توێژێکە. ئەگەر قورئان‌خوێن بخوێنێ کە «بەشی دایک لە میرات شەش-

یەکانەیە و بۆ خوشک نیوەی کوڕ دەبا؛ یا خۆ ژنێ مێردی بمرێ، چوار مانگ و دەڕۆژ ئاڤێر[1] ڕاگرێ و شتی لەم بابەتە»، ئەم باسانە، ئاوری خۆشەویستی خۆش ناکەن، مەگەر کەسێک کە ڕادەی خۆشەویستی و ئەوینی لە ڕادە بەدەر بێ و هەر دەنگێکی خۆش بەبێ سەرنجدان بە واتا و ناوەڕۆک، بیهێنێتە سەما؛ ئەم جۆرەش زۆر دەگمەنە.

**دووەم،** قورئان زۆر بیسراوە و زۆر خوێندراوە، مرۆش وایە هەرچی زۆر گوێ لێ بووبێ، کەمتر گیانی دەبزوێنێ. کەسێک سەرەتا گوێی لە شیعرێ بێ و زۆری پێ شادبێ، جارێکیتر کە گوێی لێ بێ، کەمتر هەستی دەبزوێنێ. کاتی عارەب بۆ هەوەڵ جار قورئانیان دەبیست، بە کوڵ دەگریان. ئەبووبەکر پێی دەگوتن: «کنّا کَما کُنتم ثمَّ قَسَت قُلُوبُنا»؛ واتە، ئێمەش سەرەتا وەکی ئێوە بووین، کەچی ئێستا دڵمان سەخت بووە، واتە دەگەڵ قورئان خووی گرتووە و ڕاهاتووە. کەواتە هەرچی نوێ بێ، کاریگەری زۆرترە. لەم سۆنگەوە عومەر بە حاجییەکانی دەگوت، خێرا بگەڕێنەوە بۆ شاری خۆتان. دەیگوت: «دەترسم بە کەعبە خوو بگرن و ڕێز و حورمەتی لە دڵتان بڕەوێ».

**سێهەم،** زۆربەی دڵەکان نابزوێنەوە، مەگین بە دەنگێکی خۆش. بەم بۆنەوە کەمتر کەسێک بە پەیڤین بێتە سەما و زۆرتر دەنگی خۆش و تەکووز دڵ دێنێتە سەما و هەر پەردە و دەنگی کاریگەریەکی تایبەتی هەیە. ڕەوا نییە قورئان بخرێتە نێو پەردە و گۆرانیەوە و کەم و زیادی لێ بکرێ.

کەواتە، چونکە بەبێ مووسیقا دەخوێنرێ، وەکوو پەیڤین دیارە و تەنیا ئەو دڵانەی دەبزوێنێ کە ئاورێکی بەتینیان تێدا بێ.

**چوارەم،** بۆ پترکردنی کاریگەری دەنگی خۆش، دەبێ شمشاڵ و بلوێر و دەف و تەپڵی لێ زیادکەن. ئەمانەش بە گاڵتە و جەفەنگ دەزانرێن و قورئانیش بە دوور لەوانەیە؛ دەبێ بپارێزری لە تێکەڵکردن لەگەڵ شتێک کە بە جەفەنگ دەزانرێ. پێغەمبەر ڕۆیشتە نێو ماڵی روبەییع کچی موعەووێز. کڵفەتەکانی دەفیان لێ دەدا و گۆرانیان دەخوێند. کە پێغەمبەریان دی، هاتنە پەسنی ئەودا. پێی گوتن: «وس بن! هەر ئەوەی کە پێشتر دەتانگوت بیڵێن». چونکە پەسنی ئەو بە دوور لە حەنەک[2] گوتنە و هێژاترە لەوەی بە دەف و گۆرانی ببێژرێ.

**پێنجەم،** هەرکەس حاڵ و دۆخێکی تایبەتی هەیە و پێی خۆشە لە هەوایەکدا بۆی بچڕن بە گوێرەی ئەو دۆخەی بێ، ئەگەر وانەبوو، زۆر بە کرێتی دەزانێ و ڕەنگە بڵێ بیگۆڕە بۆ شتێکیتر. دیارە ناکرێ قورئان بخوێنرێ و وای پێ بوێژرێ؛ ڕەنگە هەموو ئایەتەکانیش بە گوێرەی حاڵی گوێگر نەبن. ئەگەر

---

١- ئاڤێر: وچانی ژنی تەلاقدراو یا مێردمردوو.

٢- حەنەک: جەفەنگ، قسەی گاڵتە و گەپ.

واتای شیعرەکانی بە دڵ نەبوو، دەتوانێ بە دڵی خۆی لێی بگات و لێکی بداتەوە؛ چونکە مەرج نییە گوێگر هەر ئەو واتایە کە مەبەستی شاعیر بووە، لە شیعر هەڵبگرێ؛ کەچی بۆ قورئان ناشێ و ناڕەوایە کە بە پێی حەزی گوێگر لێک بدرێتەوە.

بەم بۆنانەی کە بێژران، شێخ و خواناسان، گۆرانی بێژیان دەهێنا و سەرجەمی ئەوەش ئەم دوو هۆوەیە: یەکەم سستی بیسەر و گوێگر، دووەم رێزگرتن لە قورئان.

**پلەی سێهەم**. لە سەمادا هەڵەکە و هەڵپەڕکێ و جلوبەرگ درین هەیە. ئەوەی کە بە ویستی خۆی نەبێ، رەوایە؛ بەڵام هەرچی بە ویستی خۆی بوو، بۆ هەڵفریواندن و خەڵەتاندنی خەڵکی بوو تا پێیان وابێ کە خێوی حاڵە و کەچی وانەبێ، ئەمە حەرامە و دوڕوویيە.

ئەبولقاسمی نەسرئابادی دەڵێ: «دەڵێم پەرژانە سەر سەما، چاترە لە خوسپەکردن». «بوعمرو بن نجید» گوتی: «ئەگەر کەسێک سی ساڵ خوسپە کاو لە پاشملەی خەڵک بخوێنێ، چاترە لەوەی لە سەمادا بە درۆ جلوبەرگی خۆی بدڕێنێ».

چاترین گوێگرتن لە سەما ئەوەیەکە گوێ بگرێ و بێدەنگ و بێ چرکە بێ و پێیدا دیار نەبێ. هێز و ورەی ئاوەها بێ کە بتوانێ خۆی رابگرێ، چونکە هەڵەکەو گریان و نەعرەتە هەموو بە بۆنەی سستییە و کەمتر کەسێک ئەوەندە بەهێزە کە خۆی رابگرێ.

واتای ئەمەی کە ئەبووبەکر گوتی «كنّا كما كُنتم ثمّ قَسَت قُلوبُنا»، ئەوە بوو کە دڵمان بەهێز بووە و توانی راگرتنی خۆی هەیە. ئەوەی پێی ناکرێ خۆرا بگرێ، دەبێ تا ئەو کاتەی کە دەتوانێ نەکەوێتە هەڵەکە و خۆی بگرێ.

گەنجێ لە پەرای جونەیددا بوو، کاتی سەمای دەبیست، نەعرەی دەکێشا. جونەید پێی گوت «ئەگەر وابکەی، برادەرم نیت». زۆر خۆی رادەگرت، هیچی نەدەگوت، تا ئەوەی هێزی پێ نەماو بانگی هەڵبڕی و ورگی تەقی و بە ئەمری خودا چوو.

بەڵام ئەگەر کەسێک هیچ دۆخێ لە خۆ نانوێنێ، کەچی هەڵەکە دەکا و دەیەوێ بە زۆر خۆ بێنێتە گریان، رەوایە. هەڵپەڕکێش حەڵاڵە، چونکە رەش پێستان لە مزگەفتدا هەڵدەپەڕان و عایشە سەیری دەکردن.

جارێک پێغەمبەر بە عەلی گوت: «تۆ لە منی و من لە تۆم»، عەلی کە خۆشیانا، هەڵدەپەڕی و وەکوو عارەب، چەن جار پێی بەسەر زەویدا دەکوتاو شادی دەکرد. بە جەعفەری گوت: «تۆ لە خوو و ئاکارتدا وەکی منی»؛ ئەویش لە شادیدا هەڵپەڕی. بە زەید کوڕی حارسەی گوت: «تۆ براو گەورەمانی»؛ ئەویش لە خۆشیدا هەڵپەڕی.

ئەگەر کەسێک بڵێ حەرامە، هەڵە دەکا؛ چونکە ئەوپەڕی ئەوەیەکە هەڵپەڕکێ یارییە و یاریش حەڵاڵە. ئەوکەسەش کە هەڵدەپەڕێ تا ئەڤینی پەروەردگاری پاکژتر و بەهێزتر و بەدەوتربێ، ئەوە پاداشی هەیە.

بەڵام ئەوەی بە ویستی خۆ جلوبەرگی بدڕێ، نارەوایە؛ چونکە فەوتاندنی ماڵە. بەڵام ئەگەر لە ویستی خۆی بەدەر بێ، رەوایە. یاخۆ ئەگەر بەویستی خۆی جلکی بدڕێ و هێزی دەروونی ئەوەندە بێ پێی نەکرێ خۆی لێ ببوێری و بە دڕینی ئەو جلکەی نەختێ ئەهوەن بێتەوە ئەوەش رەوایە.

ئەو سۆفییانەش کە جلوبەرگیان دەدڕن -بە ویستی خۆیان- و بە هەژاران و دەروێشانی دەدەن، تا بەرماڵ یاخۆ شتێکیتر بۆ خۆیان بدروون، ئەوەش رەوایە؛ هەرچەند دەبێ کەرتەکانی ئەوەندە بن کە بکرێ شتێکیان لێ بدروون.

## نەریتەکانی سەما

لە سەمادا دەبێ ئاگاداری سێ شت بن: کات و شوێن و برادەر.

هەرکات خرپلەیەکی لە دڵدا بوو، یا کاتی خواردن یا نوێژ کردن بوو - کە دڵ ئاژاوەیەکی تێدا بوو- سەما بێ قازانجە.

ئەگەر شوێنی سەما، رێ بگاری خەڵک بێ، یاخۆ ناخۆش و تاریک بێ، یا خانووی ستەمکارێ بێ، لەوێش هەروا بێ کەڵکە.

دەبێ ئەو دۆستانەش کە لەوێن، هۆگری سەما بن؛ ئەگەر لووتبەرزێکی دونیایی، گۆرانی بێژێکی بێبڕوا، یان تاقمێ هیچ نەزانی تێنەگەیو لەوێ بن کە بیری پووچیان بە دڵدا بێ و پەیڤی بەتاڵیان بە دەمدا بێ و بە خۆڕایی قسەبکەن و سەیری دەور و پشت کەن، یا تاقمێ ژن لەوێ بن و لە نێو کۆڕی سەماکەراندا گەنجی باش نەمەیوی[1] تێدابێ کە بیریان لە لای ئافرەتان بێ، ئەو سەمایە، بە کەڵکی هیچ کەسێ نایەو بێبەهرەیە.

مەبەستی جونەید لەوەی کە گوتی «بۆ سەما، کات و شوێن و هاڤاڵ مەرجن» هەر ئەمەیە. بەڵام سەما لە شوێنێکدا کە ئافرەتی جوانی لێ بێ و پیاوی لاوی هەرزەکاریش لەوێدا بێ، حەرامە. چونکە لەو سەمایەدا ئاوری شاوەت لە هەر دوولاوە پێ دەبێ و لە هەر کوێدا، سەیر کردنەکان شاوەتی بوون، تووی خراپە و داوێنپیسی دەپژێ و دێتە بەر. بۆیە ئاوەها سەمایەک حەرام و نارەوایە.

ئەوانەی بە مەبەستی سەما کۆوە دەبن، سەرەتا دەبێ بەرێز و حورمەتەوە سەرداخەن، سەیری یەکتری نەکەن، بەدڵ گوێیان لە سەما بێ، لە نێواندا قسە نەکەن، ئاو نەخۆن، سەیری دەور و پشت

---

١ - مەبەست کور و کچی گەنج و جاهێلە.

نەکەن، دەست و سەر نەجوولێنن، بەڵکوو هەر وەکوو کاتی خوێندنی شادەی نوێژ بە ڕێزەوە دابنیشێ و دڵی لە بیری خودابێ و چاوەڕوان بێ بەڵکوو ڕۆچنەیەکی لێ بکرێتەوە و خۆی ڕابگرێ و بەویستی خۆی هەڵنەستێ و نەبزوێ. ئەگەر کەسێک حاڵی لێهات و هەستایە سەر پێ، ئەمانیش هەستن، گەر سەروێنی لەسەر داکەوت، ئەمانیش سەروێنیان داخەن.

ڕەنگە هەمووی ئەمانەی بێژران، داهێنان بن و یارانی پێغەمبەر و تابعین هیچیان لێ باس نەکردبێ، بەڵام وانییە کە هەرچی نوێ و داهێنان بێ، خراپە؛ چونکە زۆرن ئەو داهێنانەی بەدەو و جوانن. شافیعی دەڵێ: «عومەری کوڕی خەتاب بە جڤاک[1] خوێندنی نوێژی تەراویحی داهێناو ئەم داهێنانە زۆر بەجێیە». کەواتە داهێنانی کرێت، ئەوەیە کە بە ئاوەژووی سوننەت بێ. بەڵام ئاکاری بەرز و شادکردنی دڵی خەڵک‌وخوا، لە شەرعدا زۆر پەسندکراوە. هەر هۆزێک داب و نەریتی تایبەت بە خۆیان هەیە و بە ئاوەژووی داب و نەریتیان بزووتنەوە، سووکایەتی بەو هۆزەیە. پێغەمبەر فەرمووی: «خالِقوا النّاسَ بِأخلاقِهِم»؛ واتە، لەگەڵ هەرکەس بە گوێرەی داب و نەریتی بژین. کە ئەو هۆزە بەم ڕێزلێنانە شادو شوکر بن بە پێچەوانەی، زیز بن، ڕێزلێنانی خوو و خدەیان لە سوننەتە. یارانی پێغەمبەر لە هەمبەر وی هەڵنەدەستان؛ چونکە لە لای ئەو زۆر ناحەز بوو. بەڵام ئەگەر لە شوێنێکدا وا باو بێ کە هەڵنەستان لەبەر پێی کەسێک، بە سووکایەتی بزانرێ، هەستانە سەرپێ هێژاتر و چاترە؛ چونکە نەریتی عارەب جۆرێکە و هی عەجەم جۆرێکی‌تر.

---

١- جڤاک: کۆمەڵ.

## بنەمای نۆهەم - فرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە

ئەمە یەکێک لە ئەستوونەکانی دینەو لە راستیدا سەرجەمی پێغەمبەران بۆ ئەم مەبەستە ناردراون و.گەر لە پێش چاوان بکەوێ و خەڵکی ئاوڕی لێوەنەدەن، هەموو دروشمەکانی شەرع پووچەڵ دەبنەوە. ئەم بەشە، لەم سێ پاژەدا راڤە دەکرێ:

**پاژی یەکەم** - واجب و پێویست بوونی چاودێری؛

**پاژی دووەم** - مەرجەکانی چاودێری؛

**پاژی سێهەم** - ئەو خراپانەی کە لە خوو و خدەدا هەن.

### پاژی یەکەم - پێویست بوونی چاودێری

فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە، فەرزە و هەرکەس لە کاتی خۆیدا بە جێی نەهێنێ، گوناحبارە؛ هەروەک پەروەردگار دەفەرمێ: وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ[1] واتە: دەبێ تاقمێ لە ئەنگۆ خەڵکی بەرەوکاری چاکە و خێر بانگ کەن و را بە خراپەیان بگرن. ئەمەیە بەڵگە بۆ گەرەک بوونی ئەم کارە، بەڵام گەرەکی کیفایەتە؛ واتە تاقمێ بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەم کارە رابن بەستە؛ کەچی ئەگەر کەس رانەبێ سەرجەمی خەڵکی گوناحبار دەبن. دیسان دەڵێ: الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ[2]؛ فەرمان بۆ چاکەی دەگەڵ نوێژ و زەکات پێکرا دانا و دیندارانی بەم پەسنە کردە سەر.

پێغەمبەر فەرمووی: «فەرمان بە چاکە بدەن، ئەگینا پەروەردگار خراپترینتان بە سەرتاندا دادەسەپێنێ و هەرچەن چاترینتان دوعای بە خێرکا، گوێی بۆ ناگرێ». ئەبووبەکر دەڵێ پێغەمبەر

---

١ ـ قورئان؛ ١٠٤/٣.

٢ ـ قورئان (٤١/٢٢) ئەوانەی وا ئەگەر لەم زەوینەدا دایانمەزرێنین، نمێژ کەرن و زەکات دەرن و فەرمان بە چاکە دەدەن و بەر لە کاری خراپ دەگرن. (هـ).

فەرمووی: «هەر نەتەوەیەک کە تێیدا گوناح بکرێ و کەس بەرەنگاری نەبێ، پەروەرندەم نەهامەتیەکیان بۆ دەنێرێ کە نووکوبەدیان دەگرێتەبەر». پێغەمبەر فەرمووی: «هەموو کارە چاکەکان لە هەمبەر خەزادا وەک دڵۆپێکن لە نێو زەریایەکی زۆر مەزندا و خەزاش لە ئاست فەرمان بە چاکەدا هەروایە». دیسان فەرمووی: «هەر پەیڤێ کە مرۆڤ دەیلێ، دژ بە خۆیە، مەگین فەرمان بە چاکە و یادی خودا و بەرگری لە خراپە». دیسان گوتی: «پەروەردگار، خاسانی بێ گوناح، بە بۆنەی خەڵکی رەمەکیەوە ئازار نادا، مەگین ئەوەی خراپەیەک ببینن و خۆی لێ گێل کەن و بێدەنگ بن». دیسان گوتی: «لە شوێنێکدا رامەوەستن کە لە کەسێک ستەم دەکەن، یاخۆ لێی دەدەن، چونکە لەحنەت دەبارێتە سەر ئەو کەسەی کە دەیبینێ و هەرچەن پێی دەکرێ بەرگری لێ ناکا». ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە نەڕۆنە نێوماڵی ستەمکاران و خونکاران و هەموو ئەو شوێنانەی خراپەیان تێدا دەکرێ و هیچ بەرگریت پێ ناکرێ؛ کەواتە، رۆیشتن بۆ ئەو شوێنانە تا پێویست نەبێ، نارەوایە. بەم بۆنەوە زۆر لە پێشوونان لە خەڵک دابڕاون، چونکە شارو دێ و بانیان لە خراپە بێوەر نەزانیوە.

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس لە لای وی گوناحێ بکرێ و ئەم پێی کرێت بێ، وەکی ئەوەیە لەوێ نەبووبێ. کەچی ئەو کەسەی لە نەبوونیدا خراپەیەک بکرێ و ئەویش پێی خۆش بێ، وەکوو ئەوەیە لە لای ئەو کرابێ». دیسان فەرمووی: «پاش هەموو پێغەمبەرێک، یارانی لە پاش ئەو بە گوێرەی کتێبی خودا و سوننەتی ئەو پێغەمبەرە ژیاون. تا ئەوەی کە پاش ئەمانە کەسانێک هاتوون کە رۆیشتوونەتە سەر مینبەر و قسەی جوان و کردەی کرێتتان لێ وەشاوەتەوە؛ لەسەر بڕواداران فەرزە کە بە دەست لەگەڵ ئەمانە بەشەڕ بێن، گەر پێیان نەکرا، بە زمان، گەر پێیان نەکرا بە دڵ، بێجگە لەمە، ئیتر موسوڵمانی نییە». دیسان فەرمووی: «پەروەردگار بە فریشتەیەکی گوت: فلان شار ژێروبان کە». گوتی: «پەروەرندەم! فلانکەس لەو شارەیە و بەقەدەر چاوتروکانێک گوناحی نەکردووە، بۆچی تێکی دەم؟» فەرمووی: «تێکی دە، هەرگیز لە هەمبەر گوناحی خەڵکی ناوچاوێکی گرژ نەکرد».

عایشە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: «خودا شارێکی کاول کرد، لە کاتێدا هەژدە هەزار پیاوی تێدا بوو کە ئاکاریان وەکوو کردەوەی پێغەمبەران بوو». گوتیان: «بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا؟» فەرمووی: «چونکە لە بۆ پەروەرندەیان لە خراپکاران توورە نەبوون».

ئەبووعوبەیدەی جەڕاح دەڵێ: «لە پێغەمبەرم پرسی کام یەک لە شەهیدەکان هێژاترن؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە بە گژ خونکارێکی ستەمکاردا بدا و لەم رێگەدا بکوژرێ و ئەگەر نەکوژرا و تەمەن درێژ بوو، هیچ گوناحێکی بۆ نانووسرێ».

لە خەبەردا هاتووە کە پەروەردگار بە یووشەع کوڕی نوونی گوت: «سەد هەزار کەس لە هۆزەکەت دەفەوتێنم: چل هەزار پیاوچاک و شەست هەزار خراپکار». گوتی «پەروەرندەم! پیاوچاکان بۆچی دەکوژی؟» فەرمووی: «چونکە لە خراپکاران تووڕە نەبوون، بەرەنگاری کاری خراپیان نەبوونەوە و لە پێوەندی و کار لەگەڵیان پاشگەز نەبوونەوە».

## پاژی دووهەم - مەرجەکانی چاودێری

چاودێری لە هەموو موسوڵمانێ پێویستە و بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەش زانینی مەرجەکانی پێویستن. چاودێری (فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە) چوار ئەستوونی هەیە: یەکەم چاودێر، دووەم چاودێری کراو، سێهەم هۆی چاودێری و چوارەم چۆینیەتی چاودێری.

### ئەستوونی یەکەم: چاودێر

مەرجی **یەکەم**، هەر ئەوەیە کە موسوڵمان و باڵق بێ؛ چونکە چاودێری بەجێهێنانی ئەرکی دینە: هەرکەس دیندار بێ، چاودێرە.

لەمەیدا کە دادوەری و فەرمانی خونکار مەرجە یان نە، جیاوازی هەیە. بەڵام بەڕای من مەرج نییە.

**بەڵام دادوەری و پارێزکاری** بۆ چاودێری و ئامۆژگاری چلۆن مەرجە؟ ئەگەر بڕیار بێ کەسێک چاودێری کا کە قەد تووشی تاوان نەهاتبێ، قەد چاودێری بەجێ نایێ؛ چونکە کەس لە گوناح بێبەش نییە. سەعیدی کوڕی جەبیر دەڵێ: «ئەگەر بڕیار بێ هیچ گوناح نەکەین تا ئەوەی چاودێری بکەین، هیچ کەسێک قەد چاودێری ناکا». لە حەسەنی بەسریان پرسی: «یەکێک دەڵێ: کەس بەرەو چاکە بانگهێشتن مەکەن و لە خراپەی مەپڕینگێننەوە تا ئەوەی بە تەواوی خۆتان پاقژ نەکەنەوە». گوتی: «شەیتان هیچ ئاواتێکی نییە، مەگین ئەوەی ئەم پەیڤەتان لە دڵ بڕازێنێتەوە، تاکوو دەرگای چاودێری هەڵچنرێ».

چاودێری لەم بابەتەدا دەبێ دوو جۆر بێ:

**یەکەم** بە مۆچیاری و راوێژکاری. هەرکەس خۆی خراپەی لێ بوەشێتەوە و کەچی لۆمەی خەڵکی کاو خەریکی ئامۆژگاریان بێ، بێجگە لەوەی خۆی بکاتە قەشمەری و گەپچاڕی خەڵکی، هیچ بەهرە نادا. ئەوە خەریکی کاری نەشیاو بێ، بۆی نییە خەریکی مووچیاری خەڵک بێ، تەنانەت رەنگە ئەو مۆچیارییە بۆی تاوانی بێ، چونکە دەزانی پێی پێدەکەنن؛ چونکە شانوشکۆی ئامۆژگاری و کاری شەرع لە چاوخەڵکیدا سووک دەکا. بەم بۆنەیە ئامۆژگاری ئەو زانایانەی خراپەکارییان ئاشکرایە، هەم

بۆ خەڵکی زیانبارەو هەم خۆشیان پێی تاوانبارن. بەم بۆنەوە پێغەمبەر فەرمووی: ئەو شەوەی سەفەری ئاسمانانم کرد، بینیم لێوی تاقمێ بە نینۆک‌گری ئاورین دەبڕنەوە. پرسیم: «ئەنگۆ کێن؟» گوتیان: «ئێمە ئەوانەین بە چاکە فەرمانمان دەدا و خۆمان نەمان دەکرد، لە خراپە بەرگریمان دەکرد و خۆمان لێی نەدەبوارد». پەروەردگار بە عیسای گوت: «ئەی کوڕی مریەم! سەرەتا مۆچیاری خۆت کە، ئەگەر سەلماندت، ئەوسا مۆچیاری خەڵک کە: ئەگینا لە پەروەرندەت شەرم کە».

جۆری **دووهەمی** چاودێری بە دەستە؛ وەکوو ڕژاندن و شکاندنی چەنگ و ڕەباب و بەرگری لە کەسێک کە تەمای کاری خراپی هەیە. ئەمە بۆ خراپکاریش ڕەوایە، چونکە هەرکەسە دوو شتی لەسەر پێویستە: یەکەم خۆی لە خراپە لابداو دووەم نەهێڵێ خەڵکی تووشی خراپە بن. جا ئەگەر کەسێک وازی لەیەکێکیان هێنا، کەی ڕەوایە واز لەوی‌تریش بێنی؟

ئەگەر کەسێک بڵێ: «زۆر کرێتە کەسێک بەرگی ئاوریشم دەبەر کا کەچی بۆ خۆی لۆمەی کەسی‌تر کا و بەرگی ئاوریشمی لەبەر داکەنێ؛ یا بۆ خۆی شەراو بخواتەوە، کەچی نەهێڵێ کەسی‌تر بیخواتەوە»؛ لە بەرسڤیدا دەبێ بڵێم: «کرێت و ناحەز شتێکە و نارەواو پووچەڵ شتێکی‌تر؛ ئەمە بۆیە کرێتە کە کاری گرینگی دەسهێشتووە، نە لەم ڕووەوە کە بۆی نییە و ڕەوا نییە. ئەگەر کەسێک نوێژ نەخۆێنێ کەچی ڕۆژوو بگرێ، لەم سۆنگە کارەکەی ناحەزە کە نوێژ ناخوێنێ و کارێکی گرینگی پەک خستووە، نەک ئەوەی کە ڕۆژوو دەگرێ و فەرزێکی بە جێ هێناوە. هەروەها جێ‌بەجێ کردن لە گوتن گرینگترە؛ بەلام هەردوویان پێویستن و بوون یا نەبوونی یەکیان، ئەویتر پووچەڵ ناکاتەوە، کە بڵێن: «بەگری لە خواردنەوەی مەی تا ئەو دەمە فەرز و پێویستە کە ئەو کەسە بۆ خۆی نەخواتەوە، کە خواردیەوە لە سەری فەرز نییە»، ئەم پەیڤە پووچەڵ و بێ‌بنەمایە.

**مەرجی دووەم،** ئیزن خواستن لە خونکارە و نووسینی سیایی چاودێری؛ ئەمەش مەرج نییە، چونکە پێشوونان بۆ خۆیان ئامۆژگاری پادشا و خونکارانیان کردووەو باسی ئەمەش دووروودرێژە. ئەم ڕاستیەت وا لێ خویان دەبێ کە ئاستەکانی ئامۆژگاری بناسی.

### ئامۆژگاری چوار ئاستی هەیە

**یەکەم،** مۆچیاری و ترساندن لە پەروەردگار؛ ئەمە لەسەر هەموو موسوڵمانێ فەرز و پێویستە و ڕاڤەی ناوێ و چاترین عیبادەت و بەندەگی پەروەردگار، پەند و ئامۆژگاری خونکارە و ترساندنیە لە پەروەردگار.

**دووەم،** بە توندی داخوڕینە؛ وەکوو ئەوەی بڵێی: «هۆی داوێن پیس! هۆی ستەمکار! هۆی نەزان! لە خوا ناترسی وادەکەی؟» هەموو ئەم پەیڤانە لە ئاستی داوێن پیسدا شیاون.

**سێیەم**، ئەوەی بە دەست بەرگری و نەهی کا؛ وەکوو رژاندنی خواردنەوە، شکاندنی رەباب، داگرتنی سەروێنی ئاوریشمین لە سەر؛ هەموو ئەمانە بەجێهێنانی بەندەگی و عیبادەتن و فەرز و پێویستن. هەموو ئەوانەی لە بەشی یەکەمدا لێی دواین، لەسەر مرۆڤی بڕوادار پێویستە و شەرع بەبێ ئیزنی خونکار، ئەم پادشاییەی داوەتە موسوڵمانان.

**چوارەم**، دەبێ بە لێدان بیترسێنێ؛ ئەگەر ئەو کەسە دەستە و هۆزی بۆ بەربەرەکانێ پێکەوە نا، ئەمیش دەبێ دۆست و یارانی کۆوەکا. بەڵام چونکە رەنگە تووشی شەڕوکێشە و زیان بن، چاتر وایە ئیزنی سوڵتانیان بە دەستەوە بێ.

زۆر سەیر نییە ئەگەر ئاستەکانی ئامۆژگاری بگۆڕن، چونکە ئەگەر کوڕێک ویستی مۆچیاری بابی کا، بێجگە لە نەرمی و راوێژ و دلۆڤانی چیدی پێ ناکرێ. حەسەنی بەسری دەڵێ:

«[منداڵ دەبێ] ئامۆژگاری کا، کە [بابی] تووڕە بوو، دەبی وس بێ». کوڕ نابێ بە توندی لەگەڵ بابی بدوێ و لێی بدا و داخوڕێ بە سەریا؛ هەروەها هەرچەن کافر بێ، نابێ بیکوژێ؛ گەر کوڕی میرغەزەب بێ، بۆی نییە حەد لە بابی خۆی بدا؛ کەواتە ئاخاوتنی میهرەبانانە و دلۆڤانانە چاترە. بەڵان ئەگەر پێی بکرێ دەتوانێ خواردنەوەی بڕێژێ، بەرگی ئاوریشمی بکاتەوە،ماڵی حەرام و بە زۆر داگیرکراوی بگێڕێتەوە بۆ خودانی، گۆزەی زیوینی بشکێنێ و رەسمی سەر دیواری لابا.

هەموو ئەم کارانە رەوان، هەرچەن بابی تووڕە و زیز بێ، چونکە کارەکەی ئەم رەوایە و تووڕەبوونی ئەو ناڕەوا. هەروەها ئەم کارە سووکایەتی بە باوکی نییە، وەکوو لێدان و جنێودان. رەنگە کەسێک بڵێ: «چونکە بابم زۆر زویر دەبێ، نایکەم»، حەسەنی بەسری گوتی: «ئەگەر تووڕە بوو، بێدەنگ بەو مۆچیاری مەکە».

هەروەها دەبێ ئەوەش بزانی، مۆچیاری کۆیلە بۆ خێوی، ژن بۆ مێردی و وەرزێر بۆ پادشا هەر وەکوو ئامۆژگاری منداڵ بۆ باوکیە. بەڵام مۆچیاری شاگرد بۆ مامۆستای ساناترە؛ چونکە ئەو راوێژ و پەندە لە سۆنگەی دینەوەیە؛ ئەگەر شاگرد بە گوێرەی ئەو زانستەی لە مامۆستای فێر بووە، بزووتەوە، مۆچیارییەکەی زۆر بەجێیە، بەڵکوو زانایەک کە بە گوێرەی زانستەکەی هەڵسوکەوت نەکا، خۆی بە دەستی خۆی، رێز و قەدری خۆی تێک داوە.

**بنەمای دووەم، ئەوەی دەبێ بەرگری لێ بکرێ**

هەر کارێک کە خراپ بێ و ئاشکراو روون بێ و مۆچیار بەبێ پشکنین بیناسێ و نەگونجاو بوونی زەق بێ، بەرگری لێکردنی رەوایە. لەمەی بێژرا چوار مەرجمان بۆ دێتە ئاراوە:

**مەرجی یەکەم**: ئەوەی کە خراپە بێ، هەر چەن گوناح نەبێ، یاخۆ گوناحی گەورە نەبێ؛ وەکوو

ئەوەی ئەگەر منداڵ یان شێتێکی دی لەگەڵ ئاژەڵێک جووت دەبێ، دەبێ بەرگری لێ بکا، هەرچەن ئەم کارە بۆ شێت و منداڵ کە ئەرکێکیان نەخراوەتە ئەستۆ، گوناح نییە؛ بەڵام چونکە شەرع بە خراپی دەزانێ، دەبێ بەرگری لێ بکرێ. هەروەها ئەگەر شێتێکی بینی کە مەی دەخواتەوە، یا منداڵێ ماڵی کەسێک دەفەوتێنێ، دەبێ بەرگری لەمانەش کا. هەروەها ئەو کردەوانەش کە گوناحن، بەڵام گوناحی بچووک، دەبێ لەوانەش، خەڵکی بپرینگێنەوە؛ وەکوو رووت‌کردنی شەرمگا لە حەمامدا، روانین بە دووی ژناندا و لە تەنیاییدا لەگەڵیان قسەکردن و کلکەوانەی زێڕی کردنە قامک و بەرگی ئاوریشم دەبەرکردن و لە گۆزەی زیوی ئاو خواردنەوە و... دەبێ بەر بەم کارانەش بگیرێ.

**مەرجی دووەم**: گوناح هەمیشە هەیە، بەڵام ئەگەر کەسێک دەستی لە گوناحێ، وەکوو خواردنەوە، هەڵگرت، نابێ ئیدی باسی بکا و سەرکونەی کا؛ مەگین بۆ راوێژ و مووچیاری. بەڵام حەد لێدان تەنیا کاری سوڵتانە. هەروەها ئەگەر کەسێک بڵێ بە تەمام ئەمشەو شەراو بخۆم نابێ دڵی بێشێنێ و ئازاری بدا، چونکە رەنگە پەشیوان بێتەوە و نەخواتەوە. ئەگەر گوتی: «ناخۆمەوە»، نابێ لێی دڕدۆنگ بێ. بەڵام ئەگەر بە تەنیا لەگەڵ ژنێک دانیشت، دەبێ بەربەستی بێ، بەرلەوەی تێکەڵی یەک ببن؛ چونکە تەنیابوون لەگەڵ ئافرەت، بۆ خۆی گوناحە؛ هەروەها ئەگەر کەسێک لەبەر حەمامی ژنان راوەستا تا کە هاتنەدەر، سەیریان کا، دەبێ مۆچیاری کا، چونکە ئەم وەستانەش بۆ خۆی گوناحە.

**مەرجی سێهەم**: ئەوەی کە گوناحەکە ئاشکراو زەق بێ. بەڵام کۆڵینەوە بۆ دیتنەوەی گوناح، ناڕەوایە؛ ئەگەر کەسێک رۆیشتە ژووری خۆی و دەرگای داخست، نابێ بەبێ ئیزنی خۆی بڕۆنە ژوورەوە بۆ ئەوەی بزانن چ دەکا، یا خۆ نابێ لەسەر بانەوە سەرەتاتکێ کەن یا خۆ گوێ رادێرن بۆ ئەوەی بزانن دەنگی گۆرانی دێ یا نە؛ هەرچەن مەبەست مۆچیاری بێ. هەرچی خودا ویستی پیوار و نادیار بێ، نابێ ئاشکرا بکرێ؛ مەگەر ئەوەی دەنگی گۆرانی و ساز بگاتە گوێ، ئەوسا بۆی هەیە بەبێ پرس و ئیزن‌خواستن بڕواتە ژوورێ و مۆچیاریان کا. ئەگەر خراپکارێ شتێکی لە ژێر داوێنی نابوو، ئەمیش پێی وابوو کە خواردنەوەیە، رەوا نییە پێی بڵێ پیشانمی دە بزانم چییە. چونکە ئەمە کۆڵینەوەیە لە ژیانی خەڵکی و کۆڵینەوەش رەوا نییە. بەڵام گەر بۆنی شەراوی بیست، دەتوانێ بیرژێنێ. هەروەها ئەگەر بەربەتێکی پێ بوو، لە ژێر بەرگەکەیەوە دیار بوو و لە بوونی ئەو سازە دڵنیا بوو، دەتوانێ بیشکێنێ؛ بەڵام ئەگەر هەستی کرد رەنگە شتێکی‌تر بێ، دەبێ چاوی لێ بنووقێنێ. چیرۆک و باسی عومەر کە لەسەر بانێکەوە رۆیشتە خوارێ و پیاوێکی دی لەگەڵ ئافرەتێک کە مەی دەخۆنەوە، لە باسی دۆستایەتیدا گێڕامانەوە. دەڵێن جارێک عومەر لەسەر مینبەر لەگەڵ یارانی راوێژیان دەکرد کە: «بەڕای ئەنگۆ ئەگەر ئیمام بە چاوی خۆی خراپەیەکی بینی، بۆی هەیە حەدیان لێ بدا؟» تاقمێ گوتیان رەوایە. کەچی عەلی گوتی: «ئەمە کارێکە کە پەروەردگار مەرجی دوو

شایەتی بۆ داناوە، یەک‌کەسی بۆ بەس نییە؛ با ئەو کەسەش ئیمام بێ». ڕەوای نەدی ئیمام بە گوێرەی زانستی خۆی لەم چەمکەدا، ببزوێتەوە و چاولێپۆشینی بەڕەوا زانی.

**مەرجی چوارەم:** دەبێ ئەو شتە ڕاستەقینەی نەشیاوبوونی دیار بێ، نەک بە گوێرەی گریمانە و بۆچوون بە ناڕەوا بزانرێ. کەواتە، شافعی مەزهەب بۆی نییە ڕەخنە لە حەنەفی مەزهەب بگرێ کە: بۆچی بە بێ سەرپەرشت مارە دەبڕن یاخۆ شەراوی خورما دەخۆنەوە و شتی لەم بابەتە؛ بەڵام گەر شافعی مەزهەب بەبێ سەرپەرشت مارەی بڕی، شەراوی خورمای خواردەوە، دەلوێ کە ڕەخنەی لێ بگیرێ و لۆمە بکرێ؛ چونکە ئەوەی لەسەر ڕێبازێ بوو و بە ئاوەژووی بزووتەوە، دەبێ ئاگاداری کەیتەوە و ئامۆچیاری کەی.

تاقمێ گوتوویانە: «پەند و ئامۆژگاری بۆ کەسێ کە شەراو بخواتەوە، توخنی بێجگە لە هاوسەری کەوێ یا خۆ گۆشتی بەراز بخوا، ڕەوایە؛ چونکە حەرامبوونی ئاشکرایە». بەڵام ئەمە هەڵەیە، چونکە ڕای زۆربەی زانایان ئەوەیە کە هەرکەس بە پێچەوانەی بۆچوونی خۆی یا ڕاوبۆچوونی خاوەن مەزهەبی جووڵایەوە، گوناحبارە؛ کەواتە، لە ڕاستیدا ئەمە حەرامە.

هەرکەس بە پێی بۆچوونی خۆی، لایەکی بە قیبلە زانی، کەچی بەرەو لایەکی‌تر نوێژی کرد، گوناحی کردووە؛ هەرچەند کەسی‌تر بە دروستی بزانێ. ئەوەش کە دەڵێ ڕەوایەو هەرکەس کەیفی خۆیە چ ڕێباز و مەزهەبێ هەڵدەبژێرێ، هەڵە دەکا و قسەی پڕوپووچ دەڵێ و شیاوی متمانە نییە؛ بەڵکوو هەرکەس لە سەریە بە بۆچوونی خۆی کارکاو کە بۆچوونی وابوو کە -بۆ وێنە- شافعی زاناترە، ئیزنی نییە بە ئاوەژووی ڕاو بۆچوونی ئەو بجووڵێتەوە، بەڵام داهێنەر کە پەروەردگار بە خاوەن جەستە بزانێ و قورئان بە ئافرێندراو و بڵێ ناتوانین قەد خودا ببینین و شتی ئاوەها، دەبێ پەندی پێ بدەین، هەرچەندە حەنەفی و مالکی ڕایان وانییە، چونکە هەڵەی ئەم کەسانە مسۆگەرەو لە فیقهدا هەڵە بە تەواوی ئاشکرا نابێ، بەڵام دەبێ لە شارێکدا پەند بە داهێنەر بدرێ، کە داهێنەر لەو شارەدا لاپرەو نامۆ بێ و زۆربەی خەڵکی ئەهلی سوننەت بن؛ کەچی ئەگەر لەو شارەدا خەڵکی دوو تاقم بوون و ئەگەر تۆ پەندت بە داهێنەر دا، ئەویش مۆچیاریتی کرد و شەڕ و ئاژاوە قەوما، نابێ وابکەی؛ مەگین بە فەرمانی سوڵتانی ئەو سەردەمە.

### بنەمای سێهەم – ئەو کەسەی کە دەبێ مۆچیاری بکرێ

دەبێ ئەو کەسە پێگەیشتبێ و ئەرکی لە ئەستۆ بێ تا کارەکەی بە گوناح بێتە ئەژمار و هەروەها نابێ خێوی ڕێزی تایبەتی بێ، وەکوو باب کە ڕێز و شانی کۆسپێکە لەسەر مۆچیاری‌کردنی. دەبێ بەرگری لە خراپکاری منداڵ و پەتیارە بکرێ، هەر چەند ئەمە ناوی مۆچیاری بەسەردا نانرێ و وەکی

ئەوەیە ئاژەڵێ لەسەر خەڵەو خەرمانی موسوڵمانێ دوور بکرێتەوە. ئەمە زۆر پێویست نییە و ئەگەر سانا بوو و هیچ کێشەیەکی تێدا نەبوو، دەبێ جێبەجێ بکرێ. بەڵام ئەگەر کەسێکی ژیر، ماڵی کەسێکی‌تری فەوتاند، ئەمە ستەمە و تاوان، بۆیە دەبێ هەرچەن تووشی ئازاریش بێ، بەرگری لێ بکاو پەند و مۆچیاری پێ بدا، چونکە بەرگری لە گوناح و تاوان، بێ رەنج و ئازار نابێ و دەبێ ئەو ئازارەش بچێژرێ، مەگین ئەوەی لە وزەی بەدەر بێ و خۆی پێ نەگیرێ. مەبەست لە ئامۆژگاری، ئاشکراکردنی دروشمەکانی ئیسلامە. کەواتە چەشتنی رەنج و ئازاری ئەم کارە پێویستە. بۆ وێنە ئەگەر لە شوێنێکدا خواردنەوەی زۆر بێ و بە رژاندنی تووشی دەردی سەر بێ، دەبێ بیرژێنێ؛ بەڵام ئەگەر مەڕ و ماڵاتێ رویشتنە نێو خەڵەی موسوڵمانێکەوە و دەیانخوارد و ئەگەر ئەم بیەوێ وەدەریان نێ تووشی دەردی‌سەر دێ، لە سەری پێویست نییە؛ دەبێ بە قەدەر ماڵی کەسانی‌تر ماڵی خاوەن خەڵە بپارێزێ؛ کاتی ئەو، مافی خۆیە و مەرج نییە بۆ ماڵی کەسێکی‌تر، ماڵی خۆی بە خەسار بدا، بەڵام بۆ بەرەنگاری لە دین و پاراستنی ئیسلام، پێویستە و فەرزە.

**راڤەی مەرجەکانی لە ئەستۆگرتنی دەردی سەرەکانی ئامۆژگاری:**

لە ئامۆجیاریدا کێشانی هەموو رەنج و ئازارێ پێویست نییە، چونکە لەمەشدا ورد بوونەوەی تایبەت هەیە. لێکدانەوەکەی وایە کە ئەگەر کەسێ لە خۆیڕانەدی پەند بە کەسێ بدا، لە سەری فەرز نییە و هەر ئەمەی کە لە دڵدا رقی لەو کارە بێ بەستە. بەڵام ئەگەر بێ‌هێز نەبوو، کەچی دەترسا لێی بدەن یا خۆ قسەی بە فێڕۆ بڕوا و کاریگەر نەبێ، ئەمە چوار جۆرە:

**یەکەم،** ئەوەی ئارخەیان بێ پەند و مۆچیاریەکەی هەم هیچ کەڵک نابێ و هەمیش دەکەوێتە بەر کوتەک و لێدان، بۆی فەرز نییە ئامۆژگاری کا، بەڵام ئەگەر کردی و ئازاری دی، خێرو ودمی زۆروزەوەندەیە؛ لە خەبەردا هاتووە کە هیچ شەهیدێک هێژاتر لەو کەسەی نییە کە بەرەنگاری پادشای ستەمکار بێ و بکوژرێ.

**دووەم،** ئەوەی دڵنیا بێ لە ئامۆژگاری هیچ زیانی تووش نابێ و پێی دەکرێ، کەچی خۆی لێ دەبوێرێ، ئەو کەسە تووشی گوناح بووە.

**سێهەم،** ئەگەر کەسێک تێگەیشت ئامۆژگارییەکەی کاریگەر نابێ، بەڵام تووشی دەردی سەریش نابێ، دەبێ بۆ رێزگرتنی شەرع، پەندی خۆی بڵێ.

**چوارەم،** ئەگەر کەسێک پێی بکرێ گوناحەکە پووچەڵ کاتەوە، بەڵام تووشی لێدان دەبێ، وەکوو ئەوەی لەپرونەکاو بە بەرد گۆزەی شەراو بشکێنێ، یاخۆ رەبابەکەیان بفەوتێنێ: ئەم کارە پێویست نییە و گوتنی ئامۆژگاری و لەسەرخۆبوون و بەکاوەخۆبوون چاترە. گەر یەکێک بڵێ بینایی چاوان

فەرمووویە: وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ[1] خۆتان تووشی فەوتان مەکەن، پەرسڤ گەڕاندنەوەی ئەوەیە کە ئیبنی عەبباس گوتی: «واتای ئەوەیە کە ماڵتان لە ڕێی پەروەرندەتان بەخت کەن، تا نەفەوتن». «بەراءِ عازِب» گوتی: «واتای ئەوەیە کە لە ماڵی خۆتان خێر بدەن و لە گوناحتان پاشگەز ببن، چونکە هەرکەس گوناح بکا و پاشان بڵێ: پاشگەز دەبمەوە، ئەو پەژیوانییە هیچ پارە ناکا». عوبەیدە دەڵێ: «واتای ئەوەیە کە گوناح دەکا و پاش ئەوە هیچ خێرو چاکەیەک ناکا».

بە کورتی، ئەگەر موسوڵمانێ خۆی لە ڕیزی کافران بدا و لێیان بکوژێ تا دەکوژرێ، ڕەوایە؛ ئەمە خۆ فەوتاندنە، بەڵام چونکە قازانجی هەیە -ئەمیش لەوان دەکوژێ و دڵیان دەتۆقنێ و دەڵێن موسوڵمانان هەموویان وان- خێری زەحف و فرەیە. بەڵام کوێرێ، یا بێ هێزێ بە تەمابێ خۆی بهاوێژێتە ڕیزی کافران، ڕەوانییە؛ چونکە بەبێ هیچ قازانجێ خۆی بە کوشت داوە.

هەروەها گەر ئامۆژگاری لە شوێنێکدا بێ کە بکوژرێ یا خۆ تووشی دەرد و کەسەر بێ و کەس واز لە گوناح نەهێنێ و ڕێزی بشکێ و دڵی داوێنپیسان نەکەوێتە لەرزە و کەس ئاوڕی لێ نەداتەوە، شیاو نییە خۆی تووشی زیانی بێ قازانج کا. لەم کارەدا دوو کێشە هەیە:

**یەکەم** ئەوەی کە ترسی ئەو لە دڕدۆنگی و دڵ پیسیە؛ **دووەم** ئەوەیە کە ڕەنگە کەسێک لە کوتەک نەترسێ، بەڵام ترسی لە دەسدانی پلە و پێگە و ماڵوسامان و ئازاری کریڤ و دۆستانی هەبێ. ئەگەر ئارخەیان بێ کە لێیدەدەن، لە سەری فەرز نییە. ئەگەر دڵنیا بوو کە تووشی ئازار نابێ، بەڵام لێی دڕدۆنگ بوو، پەند و مووچیاری لە سەری فەرزە و ئەو گومانە، گومانی خراپە. ئەگەر لێی بە گومان بوو، دەڵێین ئامۆچیاری فەرزە و بە گومان و شک، لە کۆڵ ناکەوێ؛ یاخۆ ڕەنگە بڵێن ئامۆژگاری لە شوێنێکدا فەرزە کە لە فەتەڕات بە دوور بێ.

کێشەیەکیتر کە هەیەتی ئەوەیە کە ڕەنگە زیانی ئەو ئامۆژگارییە داوێنی ماڵ و منداڵ و خزم و شاگرد و سامان و پلە و پاگەی بگرێ، یاخۆ ترسی ئەوە هەبێ کە سووکایەتی پێ بکرێ، یاخۆ ترسی ئەوەی هەبێ دەرگای قازانجی دین و دونیای لێ دابخرێ. لەم چەشنە زۆرە و بۆ هەر یەکەش دەستوورێ هەیە.

**مەترسی دەرەنجامەکانی ئامۆژگاری:** ئەم مەترسییەش دوو جۆرە:

**یەکەم** ئەوەی کە دڕدۆنگ بێ لەوەی کە لە داهاتوودا لە خێرێ بێوەر بێ؛ وەکوو ئەوەی پەند بە مامۆستای بدا و لە دوارۆژدا کەمتر بە ڕاهێنانیەوە خۆی مانوو کا. یا ئامۆژگاری پزیشک کاو لە

---

[1] ـ قورئان؛ ۲/۱۹۵.

دەرمانی ئەمدا کورتیەک کا؛ یان لە خاوەن‌کاری رەخنە بگرێ، کەچی لە دوارۆژدا مزی پێ نەدا یا کێشەیەکی بۆ بێتە دی و پشتگری لێ نەکا؛ ئەمانە هیچیان نابنە هۆیەک بۆ لادان لە فەرز؛ چونکە ئەم مەترسییانە، ترس لە خێری دوارۆژن، بەلام ئەگەر لە کاتی نیازیدا بوو، وەکوو ئەوەی کە نەخۆش بێ و پزیشک بەرگی ئاوریشمینی لەبەر کردبێ و رەخنەی ئەم بێتە هۆی ئەوەی پزیشک ئاوڕی لێ نەداتەوە، یا هەژار و نەدار بێ و چاوی لە دەستی خاوەن کاری بێ و ئەگەر لێی زیز بێ، ژیانی تووشی کێشە و گرفت بێ، لەم کاتەدا بۆی بووزدەخوا خۆی لە مۆچیاری بپارێزێ و بێدەنگ بێ. ئەم پرسەش بەسراوە بەرادەی بڕوا و بۆچوونی خۆی. دەبێ ئاگاداری دینی خۆی بێ و بەبێ‌هۆیەکی گرینگ خۆی لە پەند و ئامۆژگاری نەپارێزێ.

**دووەم** ئەوەیە کە بترسێ لەوەی کە ئەو شتەی کە هەیەتی لە دەستی بدا؛ وەکوو ئەوەی دڵنیا بێ کە ماڵوسامانی دەفەوتێ، یا لێی دەستێنن، یان بە لێدان تەندروستی دەکەوێتە مەترسییەوە، یا رێز و شکۆی لە نێو خەڵکیدا دەشکێنن، هەرچەن لێی نەدەن، هەموو ئەمانە دەتوانن ببنە هۆی خۆبواردن لە مۆچیاری و پەنددان. بەلام ئەگەر ترسی لە شتێکە کە هیچ زیانێ بە پیاوەتی و مێرخاسی ناگەینێ و تەنیا بووزدەخوا ماڵوسامانی تووشی زیان بێ -وەکوو ئەوەی بە سوادە بڕواتە نێو شار، بەرگی بە شکۆ نەکاتە بەر، یا قسەی توندی لەگەڵ کەن- پەند و مۆچیاری لە کۆڵ ناکەوێ؛ چونکە لە شەرعدا ئەمانەی بێژران پەسند کراو نین، بەلام پاراستنی پیاوەتی مەبەستی شەرعە. ئەگەر لەوەی ترسا کە خوسپەو زمان‌درێژی دەگەڵ بکرێ و بە نەیاری بزانن و بە قسەی نەکەن، بێشک ئەم بیانووە هیچ پارە ناکا؛ چونکە هیچ ئامۆژگارییەک لەمانە بەدوور نییە؛ مەگین ئەوەی گوناحەکە خوسپە بێ و بە پەندی ئەم وازی لێ نەهێنن و تەنانەت لە رقی ئەمدا پتر خوسپە کەن و لە سەر گوناح پێداگری کەن.

بەلام ئەگەر کەسێک دەترسا ئەوەی دەیلێ نەک بۆ خۆی زیان بێ، بەڵکوو زیانی بۆ کریف و خزمانی بێ، وەکوو پارێزکارێ کە دەزانێ لێی نادەن، سامانیشی نییە لێی بستێنن، کەچی بۆ تۆڵە سەندنەوە خزمان و دۆستانی تووشی ئازار دەکرێن، دەبێ خۆی لە پەند و ئامۆژگاری بپارێزێ؛ چونکە پشووەدرێژی و کاوەخۆیی لەسەر ئازاری کەسانی‌تر رەوانییە و مافی ئەو کەسانە گرینگترە.

**بنەمای چوارەم - چۆنییەتی ئامۆژگاری**

ئامۆژگاری هەشت ئاستی هەیە:

**یەکەم**، زانینی حاڵ و دۆخ، دووەم ناساندنی بەو کەسە، سێیەم پەنددان، چوارەم بە توندی دوان، پێنجەم تووندوتیژی بە دەست و زمان، شەشەم هەڕەشە و گوڕەشە کردن، حەوتەم چەک دەرهێنان و

هەشتەم کۆکردنەوەی دۆست و یاران بۆ بەربەرەکانێ. لەمانەدا دەبێ یەکە بە یەکە بڕۆینە پێشێ:

**ئاستی یەکەم** زانینی حاڵ و دۆخ: دەبێ سەرەتا دەبێ دڵنیا بێ و ڕاستەقینەی لێ خویان بێ و بۆ خۆی نەکۆڵێتەوە و لە بانەوە سەرەتاتکێ نەکاو لە جیران و دراوسێیان نەپرسێ و ئەگەر کەسێک شتێکی لە ژێر دامین بوو، سەیری نەکاو هەڵینەداتەوە تا بزانێ چییە. ئەگەر بەبێ پشکنین دەنگی سازی بیست، یا بۆنی شەراوی ژنەفت، دەتوانێ مۆچیاری بکات.

ئەگەر دوو زەلامی بەداد ئاگاداریان کردەوە، لێیان قبووڵ کا. هەروەها بۆی هەیە تەنیا بە گوێرەی شایەتی دوو مرۆی دادگەر بەبێ پرس و را بڕواتە ژووری. بەڵام بە تەنیا شایەتی یەک مرۆی بەداد چاتر وایە کە نەڕوا، چونکە خانوو هی خۆیە و بە شایەتی یەک کەس مافی خێوەتییەکەی پووچەڵ نابێتەوە. دەڵێن نەخشی سەر کلکەوانەی لوقمان ئەمە بوو «شاردنەوەی ئەو شتەی بە ڕاشکاوی دیتت، هێژاترە لە ڕسوا کردن بە گوێرەی گومان».

**ئاستی دووهەم**، ناساندنە. ڕەنگە کەسێک کارێکی لێ بوەشێتەوە و خۆی لە دزێو بوونی بێئاگا بێ؛ وەکوو ئەوەی لادێییەک لە مزگەفتدا نوێژ کا و بە تەواوی رکووع و سجوود بەجێ نەهێنێ، یان پیساییەک بە پێڵاویەوە بێ و خۆی پێی‌نەزانێ و ئەگەر بزانێ کە نوێژ خوێندنی ئاوەها دروست نییە، نەیدەخوێند، دەبێ پێی بڵێت و فێری کا؛ هەروەها دەبێ بە دلۆڤانی و ڕووی گەشەوە پێی فێر بکرێ و دڵی نەیشێنێ؛ چونکە بەبێ‌هۆ دڵشکاندنی موسوڵمانان شیاو نییە. کە شتێکت بە کەسێ فێر کرد، لە ڕاستیدا بە نەزانت پێناسە کردووە و کەمایەسی ئەو کەسەت، لە لای خۆی گوتووە؛ دەبێ ئەم برینە دەرمان بکرێ و دەرمانەکەشی ئەوەیە کە نەزانییەکەی پاکانەکەی و پێی بڵێی: «کەس بە زانایی لە دایک نابێ، بەڵام پێویستی ئەو شتانەی نایانزانین فێر بین. ئەوەی نەزانە، نەزانییەکەی لە ئەستۆی دایک و باب و مامۆستایە؛ مەگەر ئەوەی لەو دەڤەرەی کە ژیاوە کەس نەبووە فێریان بکاو ڕایان بێنێ». دەبێ بەم کارانە دڵی بدەیتەوە و گەر کەسێ واینەکرد، وەکوو ئەو کەسەیە کە خوێنی سەر جلکی بە میز دادەبشۆرێ، یاخۆ دەیەوێ چاکەیەک بکا، خراپەیەک دەکا.

**ئاستی سێهەم**، پەند و ئامۆژگاری بە میهرەبانی بڵێ نەک بە زۆرداری. ئەگەر زانی شتێ حەرامە، ناساندنی ئەو خراپەیە کەڵکی نییە و دەبێ بیترسێنێ. بە بەزەییەوە ئامۆژگاری‌کردنی ئاوەهایە کە ئەگەر کەسێک خوسپەی کەسی‌تری دەکرد، پێی بڵێ: «کێهە لە مەمانان کە بێ کەمایەسی بێ؟ پەرژانە سەر خۆ چاترە». یا خۆ ئایەتێک سەبارەت بە خراپەی پاشملەخوێندن بخوێنێتەوە.

ئەمەش زیانێکی ئێجگار گەورەیە، تەنانەت بۆ ئەو کەسەش کە گوێی لێ دەگرێ. ئامۆژگاری دوو فیزودەمار دەداتە نەفس: **یەکەم** ئاشکراکردنی رادەی زانست و پارێزکار بوونی خۆ، **ئەویتر** دەستووردان و پیشان‌دانی بەرزی و هێژایی خۆ بەسەر ئەو کەسەدا. هۆی ئەم دوانەش حەز بە پلە و

پاگەیە، کە لە سروشتی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ. کابرا پێی وایە کە خەریکی ئامۆژگاری و بەندەگی خوایە، کەچی خەریکی بەجێ هێنانی بەندەگی ئارەزووەکانی نەفسە. ئەم گوناحەی کە تووشی بووە، رەنگە لە گوناحی کابرا خراپتر بێ. ئەگەر پێی خۆش بێ کە کابرا بۆ خۆی لە هەڵەی بگات و لە کردەی خراپی پاشگەز بێتەوە، یا پێی خۆش بێ کە کەسێکیتر مۆچیاری بکا و لە هێڵی لاری ئاگەداری کاتەوە، مۆچیارییەکەی راست و بێخەوشە؛ بەڵام گەر پێیخۆش بێ کە بە ئامۆژگاری ئەم ئەو کەسە واز لە گوناح بێنێ، دەبێ لە خوا بترسێ، چونکە رەنگە بە مۆچیارییەکەی خۆی بەرەو لای خۆی گاسی بکا، نەک پەروەرندەی.

لە داوودی تاییان پرسی: «رات چییە سەبارەت بەو کەسەی دەڕواتە لای پادشا و مۆچیاری دەکا و پەندی پێ دەدا؟» گوتی: «دەترسم بە قەمچی لێی دەن» گوتیان: «ورەی ئەوەی هەیە». گوتی: «دەترسم بیکوژن». گوتیان: «توانی ئەوەشی هەیە». گوتی: «لەو بەڵای کە گەورەترین و پیوارترینە دەترسم؛ واتە لە خۆبایی بوون».

بووسلەیمانی دارانی گوتی: «ویستم رەخنە لە فلان خونکار بگرم، هیچ ترسم لە لێدان و کوشتن نەبوو؛ بەڵام خەڵکی زۆر ئاپۆرەیان دابوو، ترسام خەڵکی راستی و دەنگدلێریم ببینن و پێم شرین بێ و ئەو کات ترسام کە بە ناپاکی و خەوشەوە بکوژریم».

**ئاستی چوارەم،** بە توندی داخوڕین. ئەمەش دوو جۆرە:

**یەکەم** ئەوەیە کە گەر بۆی بلوێ بە میهرەبانی و دلۆڤانی بدوێ چاترە و دانەخورێ باشترە.

**دووەم،** ئەگەر بە توندی ئاخاوت، جنێو نەداو بێجگە لە قسەی راست چیتر نەڵێ؛ وەکوو «ستەمکار» و «خراپکار» و «نەزان» و «نەفام»، پتر لەمانە نەڵێ: چونکە ئەوەی گوناح کا، نەفامە؛ پێغەمبەر فەرمووی: «ژیر ئەو کەسەیە کە کاری خۆی هەڵدەسەنگێنێ و پاشەڕۆژی خۆی دەبینێ، کەچی نەفام ئەوەیە رەدووی خوزیا و بریای نەفسی دەکەوێ و نازی خۆی دەداو هیواداری لێی ببوورن». دەبێ ئەو کاتە بە توندی بدوێ کە دڵنیا بێ کاریگەر دەبێ؛ کەزانی هیچ کەڵکی نییە، ئەوسا روو گرژ کاو بە سووکی سەیری کاو لێی دووری بگرێ.

**ئاستی پێنجەم،** توندوتیژی کردنە بە دەست؛ ئەمەش دوو جۆرە:

**یەکەم** تا پێیدەکرێ بە گوتن دژایەتی کا؛ وەکوو ئەوەی بە کەسێک بڵێ لە زەوی داگیرکراو بڕواتە دەر، لەسەر رایەخی ئاوریشم هەستێ، ئەگەر لەش پیسە لە مزگەفت بڕواتە دەر.

**دووەم** ئەگەر گوتن کەڵکی نەبوو، بە زۆر بیکاتە دەر؛ بۆ ئەمەش دەبێ کەمترین کار کات: ئەگەر دەکرێ دەستی بگرێ و رایکێشێ، نابێ ردێنی یا خۆ پای بگرێ؛ کە چەنگ دەشکێنێ نابێ وردی کا؛ درزی بەرگی ئاوریشم یەواش یەواش بکاتەوە تا تەواو دانەدڕێ؛ ئەگەر دەتوانێ شەراو بڕژێنێ،

دەفرەکەی نەشکێنێ، ئەگەر پێی نەکرا بیرژێنێ -چونکە توند رایگرتبوو- بۆی هەیە بەردێکی بە سەردا داو بیشکێنێ؛ ئەگەر جێگەی شەراوەکە جامێکی بلوورینی سەر تەنک بوو، رژاندنی زۆری دەخایاندو دەیانگرد و لێیان دەدا، بۆی هەیە بیشکێنێ و هەڵبێ. سەرەتا کە شەراو حەرام کرا، گوتیان دەفرەکەشی دەبێ بشکێ؛ بەڵام ئێستا ئەو دەستووره پووچەڵکراوە. هەروەها گوتوویانە جۆرێ گۆزە هەبووە کە تەنیا شەراویان تێ کردووە، بەڵام ئێستا بەبێهۆ نابێ بشکێ و هەر کە بیشکێنێ تاوانی کردووە.

**ئاستی شەشەم،** هەڕەشەکردنە، هەروەک بڵێ: «شەراوەکەت برژێنە، ئەگینا سەرت دەشکێنم و واو وات لێ دەکەم». ئەمەش لە کاتێکدا رەوایە کە بە میهرەبانی مۆچیاری کردن هیچ کەڵکی نەبێ. ئەمەش دوو جۆرە:

**یەکەم،** نابێ هەڕەشەیەکی لێ بکا کە نابەجێ بێ؛ وەکوو ئەوەی بڵێ: «جلکەکەت دەدڕم، خانیت دەرووخێنم، ژن و منداڵت دەڕەنجێنم». **دووەم،** دەبێ شتێ بڵێ کە پێی بکرێ و درۆ نەبێ؛ وەکوو ئەوەی نابێ بڵێ «سەرت دەبڕم، یا خۆ هەڵتدەواسم»، هەڕەشەی وەک ئەمە هەمووی درۆیە. بەڵام ئەگەر هەڕەشەیەکی زۆرتر کاو بزانێ کە بەم هەڕەشە ترس دەکەوێتە دڵی و کەڵکی دەبێ، رەوایە؛ هەروەک ئەگەر ویستی دوو کەس پێکەوە ئاشت بداتەوە و لە قسەدا بەلای ئەم یا ئەویاندا رۆیشت، رەوایە.

**ئاستی حەوتەم،** لێدانە بە دەست و پێ و دار؛ ئەمەش رەوایە، بەڵام بە قەدەر نیاز و لە کاتی پێویستدا. کاتی پێویست ئەوەیە کە دەست لە گوناح هەڵنەگرێ تا لێی نەدرێ؛ کە وازی هێنا، لێدان نارەوایە؛ چونکە سزای پاش گوناح حەدد و تەمبێیەو ئەوەش تەنیا کاری سوڵتانە.

شێوازی ئەمەش وایە کە ئەگەر لێدان بە دەست بۆی بەس بێ، بە دار لێی نەدا و لە ڕوومەتیشی نەدا. ئەگەر ئەوە بەس نەبوو، دەتوانێ شیری لە روو بکێشێ؛ ئەگەر کەسێک ژنێکی داگرتبێ و وازی لێ نەهێنێ، مەگین بە شمشێر، رەوایە شیری بۆ دەرێنێ. ئەگەر رووبارێکیان لە نێواندا بوو، تیری بۆ بنێتە نێو کەوان و بڵێ «واز بێنە، ئەگینا لێت دەدەم». ئەگەر وازی نەهێنا، رەوایە لێی بدا؛ بەڵام دەبێ دەست بۆ پای بگرێ و لەو شوێنانەی کە مەترسی کوشتنی هەیە، خۆ بپارێزێ.

**ئاستی هەشتەم،** ئەگەر بە تەنیا پێی نەکرا بەرگری لێ بکا، دەبێ خەڵکی کۆوە کاو دەگەڵی بە شەڕ بێ؛ رەنگە خراپکاریش تاقمێ کۆوەکا و شەڕ بقەومێ. تاقمێ گوتوویانە: «کەوا بوو، بە بێ ئیزنی ڕێبەر و پێشەوا رەوا نییە؛ چونکە ئاژاوە دەقەومێ و کارەسات روودەدا». تاقمێتر گوتوویانە کە رەوایە، هەروەک چۆن خەزاکردن بێ ئیزنی ئیمام رەوایە، شەڕکردن دەگەڵ خراپکارانیش هەروایە و تەنانەت ئەگەر مۆچیاریکەر بکوژرێ، شەهیدە.

**نەریتەکانی مۆچیاری کەر**

مۆچیاری‌کەر دەبێ سێ دانستەی هەبێ: زانیاری، پارێزکاری و ئاکاری جوان؛ ئەگەر زانا نەبوو، خاس و خراو لێک جیا ناکاتەوە؛ ئەگەر پارێزکار نەبوو، هەر چەند چاک و خراپ دەناسێ، بەلام بە قەستی خراپەوە ئامۆژگاری دەکا؛ ئەگەر ئاکار بەرز نەبوو، کە دەیڕەنجێنن، تووڕە دەبێ و خوا لە بیر دەکا و لە رادەی شیاو تێدەپەڕێ و بە گوێرەی نەفسی دەجوولێتەوە نەک رەزای خودا؛ ئەوسا مۆچیارییەکەی دەبێتە گوناح و تاوان. لەم سۆنگەوە بوو کاتێ عەلی کافرێکی دا بە عەرزا و ویستی بیکوژێ و کابرا تفی لێکرد، نەیکوشت و گوتی: «تووڕە بووم، ترسام لەبەر رەزای خوا نەیکوژم». عومەر بە قەمچی لە کەسێکی دەدا، ویستی لەویتریش بدا، کەچی کابرا جنێوی پێدا. دەستی راگرت و لێی نەدا تا هێوڕ بووەوە. پرسیان: «بۆ دەستت راگرت؟» گوتی: «تا ئێستا بۆ رەزای خوا لێم دەدا، کە جنێوی پێ دام، ئەگەر لێم دایە، بە تووڕەییەوە لێم دەدا». بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «ئامۆژگاری ناکا، مەگین پیاوێ زانا بێ بەسەر ئەو شتەی دەیلێ، هۆزان بێ بەو چاکەی فەرمانی لە سەر دەدا و ئەو خراپەی بەرگری لێ دەکا و بە بەزەیی بێ لەو شتەی کە فەرمانی لە سەر دەدا و ئەو گوناحەی بەربەستی دەکا». حەسەنی بەسری دەلێ: «بە هەرچی ویستت فەرمان بدەی، دەبێ سەرەتا خۆت بە کاری بێنی و گوێڕایەلی بی». ئەمە ئەدەبە، بەلام مەرج هەر ئەوەیە کە لە پێغەمبەریان پرسی: «فەرمان بە چاکە بدەین و بەگری لە خراپە بکەین، یا سەرەتا خۆمان بە جێی بێنین؟» فەرمووی: «نە، ئەگەر هەمووشتان بە جێ نەهێنا، واز لە مۆچیاری مەهێنن».

لە شێوازەکانی ئامۆژگاری ئەوەیەکە دەبێ تەن بخاتە ئازار و پشوودرێژ بێ، چونکە خودا دەفەرمێ: وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ[1] ئەوەی لە هەمبەر رەنج و ئازار پشوو درێژ نەبێ، ئامۆژگاری پێ ناکرێ.

لە نەریتە گرینگەکانی ئامۆژگاری ئەوەیە کە دەبێ تەماکورت و کەمویس بێ؛ چونکە لە هەر کوێدا تەما هەبوو، ئامۆژگاری بەتالە. یەکێک لە مەشایخ پشیلەیەکی هەبوو، هەموو رۆژێ لە لای قەساو لکی بۆ دەبردەوە. رۆژێ کاریکی دزێوی لە قەساب دی. گەڕایەوە خانووی خۆی و پشیلەی دەرکرد و رۆیشتەوە بۆ لای قەساو و مۆچیاری کرد و پەندی پێدا. قەساو گوتی: «تاکوو لە لای من لک دەبەی، ئامۆژگاریت پێ ناکرێ». شێخ گوتی: «سەرەتا پشیلەکەم دەر کرد و پاشان هاتم بۆ ئامۆژگاریت».

---

١ ـ (قورئان، ١٧/٣١) هانەی کاری چاکە بدە و بەر لە کاری خراپ بگرە و چت بە سەر هات، خوراگر بە. (هـ).

ئەوەی پێ خۆش بێ خەڵک خۆشیان بوێ و پەسنی کەن و لێی ڕەزابن، ئامۆژگاری پێ ناکرێ. کەعبولئەحبار بە ئەبوو موسلمی خولانی گوت: «بارودۆخت لە نێو هۆزەکەتدا چۆنە؟» گوتی: «باشە». گوتی: لە تەوراتدا دەڵێ: «ئەوەی لە نێو هۆزەکەیدا ئامۆژگاری کا، حاڵی لە نێو هۆزیدا چاک نییە». گوتی: «تەورات ڕاست دەڵێ ئەبووموسلیم درۆ».

سەرەکیترین شت بۆ ئامۆژیار ئەوەیە کە بۆ گوناحباربوونی گوناحکار پەشێو و خەمبار بێ؛ بە چاوی بەزەیی سەیری بکا، بە چەشنێ بەرگری لە گوناحی هەموان بکا، کە بەرگری لە زاڕۆی خۆی دەکا و بە میهرەبانی سەیری خەڵک بکا. یەکێک بە توندی ئامۆژگاری مەئموونی دەکرد، مەئموون گوتی: «ئەی مێرخاس! خوای مەزن چاتر لە تۆ نارده سەر خراپتر لە من و پێی گوت "بەنەرمی بدوێ". مووسا و هاروونی نارده سەر فیرعەون و پێی گوتن: فَقُولَا لَهُ قَوْلاً لَيِّنًا[1]؛ بە نەرم و نیانی بیدوێنن، شایەتا بیر بکاتەوە». دەبێ پێڕەوی لە پێغەمبەر کا، کاتێ گەنجێ هاتە لای و پێی گوت: «ئەی پەیغەمبەر ئیزنم دەدەیتێ تا زینا کەم؟» یارانی پێغەمبەر لێی تووڕە بوون و ویستیان لێی دەن. پەیغەمبەز فەرمووی وازی لێ بێنن. بانگی لێکرد هاتە بەرەوە چۆک و بە چۆکی ممبارەکی پێغەمبەر دانیشت. فەرمووی: «ئەی جوامێر! پێت خۆشە کەسێ لەگەڵ دایکت وابکا؟» گوتی «نە». فەرمووی: «خەڵکیش هەروان». دیسان پرسی: «پێت خۆشە لەگەڵ خوشک و کچت وابکەن؟» گوتی «نە». فەرمووی «خەڵکیش هەروان. ئەی پێت خۆشە دەگەڵ پوور و پلکت وا بکەن؟» گوتی: «نە». یەک بە یەک هەمووی هەڵدا و ئەویش گوتی «نە». پاشان پەیغەمبەر دەستی بەسەر دڵیدا هێناو گوتی: «پەروەرندەم! دڵی خاوێن کە و لە داوێنپیسی بیپارێزە و لە گوناحەکانی خۆش بە!» کە لەوێ گەڕایەوە، هیچ شت فرەتر لە زینا لە لای کرێت نەبوو.

بە فوزەیلی عەییازیان گوت: «سەفیانی عەینە خەلاتی لە سوڵتان ئەستاندووە». گوتی: «بەشی ئەو لە بەیتولماڵ پتر لەویە». کە دواتر لە تەنیاییدا چاوی پێکەوت، لۆمەی کرد و پلاری تێگرت. سەفیان گوتی: «ئەی ئەباعەلی! هەر چەندە ئێمە لە ریزی پیاوچاکان نین، بەڵام چاکانمان خۆش دەوێ».

«وصلة بن أشْيَم» دەگەڵ شاگردەکانی دانیشتبوو. پیاوێ ڕابورد، داوێنی بە دوایدا دەکشا؛ هەروەک ڕەوشتی لووت بەرزانی عەرەبە و بەرگری لێکراوە. شاگردەکانی ویستیان بە گژیدا بچن. گوتی: «بێدەنگ بن، خۆم چاری دەکەم».

بانگی کرد: «هۆکاکە! کارێکم پێتە». گوتی: «چییە؟» گوتی: «نەختێ دامێنەکەت هەڵدەبڕی». گوتی: «بەڵێ و سپاست دەکەم». بە شاگردەکانی گوت: «ئەگەر بە توندی پێم بگوتایە، دەیگوت

---

١ ـ قورئان، ٢٠/٤٤.

نایکەم؛ تەنانەت ڕەنگە جنێویشی پێ بدایام».

پیاوێ ژنێکی هەڵگرتبوو، شیرێکیشی لە دەستدا بوو، کەس نەیدەوێرا بەرەنگاری بێ و ژنەش هاواری دەکرد. بێشری حافی بە تەنشتیدا ڕابورد، بە ئەسپایێ شانی دای لە شانی. کابرا کەوت و بووراییەوە و عارەق لەسەرورووی هاتە خوارەوە و ژنەش ڕزگار بوو. لە کابرایان پرسی: «چ قەوما؟» گوتی «نازانم؛ کابرایەک بە تەنیشتمدا ڕابورد، شانی دای لە شانم. بە هێواشی پێی گوتم: "خوا خەریکە سەیرت دەکا، خەریکی چیت؟" لە ترسی ئەم پەیڤە بوورامەوە». گوتیان: «ئەو کابرایە، بێشری حافی بوو». هەناسەیەکی هەڵکیشا و گوتی: «بەم شەرمەسارییەوە چۆن سەیری کەم». دەمودەس یاو وتا دایگرت و حەوتەیەک کەوتە جێ و بەرەو جیهانی خامۆشان باری کرد.

## بەشی سێهەم - ئەو خراپیانەی کە خەڵک زۆریان خوو پێ کردووە

بزانە، لەم ڕۆژگارەدا جیهان پڕ لە خراپەیە؛ خەڵکی لە چاک بوونی هیوا بڕاون؛ چونکە بەسەر هەموو خراپەکاندا زاڵ نین، وازیان لەوەش کە پێیان چاک دەکرێ، هێناوە. ئەمە دۆخی دیندارانە، نائاگایان ئەوەی باوە لایان تەواوە و پیێ ڕەزان. لێرەدا بە چەن ئامۆژگارییەک ئاماژە دەکەین، چونکە لێرەدا سەرلەبەری نایەتە گوتن. ئەم خراپانە، هەندێکیان لە مزگەفت و برێ لە بازاڕ و تاقمێ لە نێو ڕێ و هەندێ لە گەرماو و نێو ماڵانن.

### مونکەراتی مزگەفت

بریتییە لەوەی کە کەسێک نوێژ بە ناتەواوی و قورئان بە هەڵە بخوێنێ. بانگبێژان وەکوو گۆرانی چڕین، بانگ ببێژن، واتە دەنگیان بکێشن، هەموو ئەمانە بەرگرییان لێکراوە، لە کاتی گوتنی «حَيَّ عَلَى الصَّلوة»دا ڕوو بە تەواوی لە قبیلە وەگێڕێ. هەروەها وتەوان بەرگی ڕەشی ئاوریشمین دەبەرکا، شیری زێڕکاری لە پشتێن کا؛ ئەمانەش حەرامن. یا خۆ کەسانێ کە لە مزگەوت لەنگەر دەخەن و قسەی هیچوپووچ دەکەن، چیرۆک دەگێڕنەوە و شیعر دەخوێننەوە، یا خۆ دوعای چاوەزار و شتیتر دەفرۆشن. ئەوانەی لە مزگەفتن، لە دەست ئەمانەوە ئازار دەچێژن؛ بەڵام منداڵێ کە بێدەنگ بێ و شێتێک کە ئازاری بە کەس نەگا و مزگت پیس و پوخڵ نەکا، ڕەوایە لە مزگەوت بمێننەوە. ئەگەر منداڵ جاربەجارێ یاری کرد، نابێ بەرگری لێ بکرێ، چونکی ڕەشپێستەکان لە مزگەوتی مەدینەدا خەریکی هەڵپەڕکێ و یاری بوون و عایشە سەیری دەکردن؛ هەرچەند نابێ ببێتە یاریگە، ئەگەر بوو بە یاریگە، دەبێ بەرگری لێ بکرێ. ئەگەر کەسێک لە مزگەوتدا شتێ بدرووێتەوە یا خۆ بنووسێتەوە و ئازاری بەکەس نەگا، ڕەوایە. بەڵام ئەگەر بیکاتە دووکان و بەردەوام لەوێ ئەم کارانە کا، دزیوە.

کارێک کە ببێتە هۆی ئاپۆرەی خەڵکی وەکوو بەردەوام پەرژانە سەر تاپۆ نووسین، ڕەوانییە، مەگین جار بە جار دەستوور درابێ. پێغەمبەر جار بە جار ئیزنی داوە، بەڵام بۆ ئەو کارە دانەنیشتووە. یان ئەوەی جل شۆرێک، جل‌وبەرگەکانی کە مزگەفتدا وشک کاتەوە، یا خۆ ڕەنگرەز، لە مزگەفتدا قوماش ڕەنگ کا، حەرام و ناڕەوایە؛ هەروەها ئەوانەی لە مزگەوتدا ڕۆدەنیشن و سەربهوردی پەیغەمبەر بە نوقسانی دەگێڕنەوە و حەدیسێک دەڵێن کە لە حەدیسی جێ متمانە بەدەرە کارەکەیان نەگونجاوە. ئەمانە دەبێ وەدەر بخرێن؛ چونکی پێشوونان وایان کردووە. ئەو کەسانەی خۆ دەڕازێننەوە و شاوەتیان بە سەردا زاڵە و بە شیعرەوە دەپەیڤن و ئافرەتانی لاویش لەو کۆڕەدان، ناڕەوایە؛ تەنانەت لە دەرەوەی مزگەوت. وتەبێژ دەبێ پیاوێکی پیاوانە و ڕێک‌وپێک و بەدین و بڕوا و بەشان‌وشکۆ بێ؛ بە هەر جۆر کە بێ نابێ بەبێ لەمپەر لە بەرانبەر ژنان و کوڕانی جواندا دابنیشێ و بپەیڤێ. عایشە لە سەردەمی خۆیدا بەرگری لە هاتنی ژنان بۆ مزگەوت دەکرد، کەچی لە ڕۆژگاری پەیغەمبەردا وانەبوو. دەیگوت: «ئەگەر پێغەمبەر دەیدی ئێستا چ دۆخێکە، ئەویش بەرگری دەکرد».

لەو کارە کرێتانەی کە نابێ لە مزگەوتدا بکرێن، دانانی نووسینگەو ڕاگەیشتن بە مامەڵەی گوندییەکانە؛ یا خۆ هەندێ دادەنیشن بۆ سەیرکردن و خوسپە و قسەی پڕوپووچ. هەموو ئەم کارانە خراپن و نابێ بکرێن و بە ئاوەژووی ڕێزی مزگەوتە.

## مونکەراتی بازاڕ

ئەوەیە کە بۆ فرۆتنی کاڵا درۆ دەکەن، یا خۆ نوقسانی دەشارنەوە، سەنگ و ترازوویان ناڕاستە، لە کۆتاڵدا دەغەڵ دەکەن، چەنگ و ساز دەفرۆشن، لە بۆ جێژنانەی منداڵان دەمامکی گیانداران دەفرۆشن، شیرو قەڵغانی دارین بۆ نەورۆزانە دەفرۆشن، کاڵا و قوماشی ئاوریشم بۆ جلکی پیاوان دەفرۆشن، بەرگی پینەکراوی گازرشۆر بە نرخی نوێ دەفرۆشن. بە گشتی هەموو ئەو شتانەی خەملێنەری خانووبەرەن وەکوو دەفر و گۆزەو قەڵەمدانی زێڕ و زیو و شتی وا.

لەم شتانەی بێژران هەندێکیان حەرامن و برێکیان کرێت. دەمامکی گیانداران، حەرامە. بەڵام ئەوەی بۆ جێژنی نەورۆز دەفرۆشرێ، وەکوو شیر و قەڵغانی دارین، بۆ خۆی حەرام نییە، بەڵام چونکە یادی ڕۆژانی ئاورپەرستی و سەردەمی گاوران زیندوو دەکاتەوە بە ئاوەژووی شەرعە و هەرچی بۆ ئەو ڕۆژانە بکرێ ناڕەوایە؛ تەنانەت لە بۆ نەورۆز خەملاندنی بازاڕەکان و فرۆتنی نانی جۆراوجۆر، ناڕەوایە؛ چونکە دەبێ ئەو جێژنانە کۆوە بکرێن و کەمتر ناویان بهێنرێ، تا لەبەر چاوان سووک و بێ فەڕ بن. تەنانەت هەندێ لە پێشوونان گوتوویانە «دەبێ ڕۆژی نەورۆز ڕۆژوو بگیرێ تا لە خواردنەکانی نەخورێ

و شەوی جێژنی سەدە[1]، نابێ چرا پێبکرێ تا ئاور دیار نەبێ».

هەندێ تۆژەریش گوتوویانە: «ڕۆژووگرتن لەم ڕۆژەدا، بە جۆرێک یادکردنی ئەو ڕۆژەیە. نابێ بە هیچ کلۆجی ناوی ئەم ڕۆژە ببرێ. دەبێ لەگەل ڕۆژانیتر وەکوو یەک بن؛ شەوی سەدەش هەروا، تا هیچ ناویان لێ نەمێنێ».

**مونکەراتی ڕێگای هات و چۆ**

ئەوەیە کە لە نێو ڕێدا ئەستوون دادەنێن یا خۆ دووکان دەکەنەوە و ڕێگا تەسک دەکەن؛ دار دەچێنن، بانیژە چێ دەکەن، بە چەشنێ کە ئەگەر کەسێک سواری ولاخێ بێ پێیدا دەدا و سەرەوژێر دەبێ و بار و عەدل دادەنێن، چوار پێ دەبەستنەوە و ڕێگا دەگرن و هات و چۆ دژوار دەکەن؛ ئەمەش نارەوایە، مەگەر بە قەدەر نیاز کە بار دابنێن و خێرا رایگوێزنەوە بۆ نێو ماڵ. باری درک، کە جلوبەرگی خەلکی بدرێنێ، نابی لەسەر ڕێ تەنگەبەر دابنرێ، مەگین ئەوەی هیچ شوێنیتر بێجگە ئەو شوێنەی بۆ نەبی، ئەوسا چونکە نیازە، رەوایە.

بارکردنی ولاخ پتر لە توانی، نارەوایە. قەساوی لە سەرەرێ و لە بەرچاوی خەلک، بە چەشنێ کە جلکی خەلکی پیس بکا، نارەوایە و دەبێ لە دووکانەکەیدا شوێنێکی بۆ رەچاو کا. پێستی کالەک هاویشتنە سەرڕێی خەلکوخوا یا خۆ ئاو ڕژاندنە سەر ڕێگا، بە چەشنێ کە مەترسی هەلدێرانی خەلکی بێ، دزێوە. هەروەها ئەوەی بەفر بهاوێژێتە سەرەڕێ، یاخۆ ئاوی سەربانی خانووەکەی لەسەر ڕێدا گۆماو ببەستێ، لە سەری خانەخوێیە کە پاقژی کاتەوە.

بەلام ئەوەی گشتی بێ، لەسەر هەمووان پێویستە و حاکم دەبێ خەلک بۆ پاکژ کردنەوەی هان بدا. ئەوەی سەگێکی لە بەردەرکیدا دابەستبێ و خەلکی لیێ بترسن، دەبێ لایبا؛ بەلام ئەگەر تەنیا زیانی ئەوە بێ کە ڕێگا پیس و پوخل دەکا، نابێ بەرگری لێ بکرێ؛ چونکە خەلکی دەتوانن خۆیان لە پیسابیەکەی ببوێرن؛ بەلام ئەگەر لە سەرەڕێدا بخەوێ و ڕێگا بە خەلکی تەسک بکا، دەبێ لابرێ؛ چونکە تەنانەت خێوەکەشی ئیزنی ئەوەی نییە لەسەر ڕێدا دابنیشێ یان هەلاژێ چ بگا بە سەگەکەی.

**مونکەراتی گەرماو**

ئەوەیەکە شەرمگایان لە ناوکەوە تا ئەژنۆ داناپۆشن. یاخۆ رانیان لە پێش حەمامچی دادەنین تا

---

[1] ـ سەدە: جێژنێکی کەونی ئێرانیەکانە. لە شەوی دەی ڕێبەندان ئاوریان دەکردەوە. ئەم جێژنـە لـە سـەردەمی زەردەشـتییەکان و سەدەکانی سەرەتای ئیسلامدا بەرێوە دەبرا. ئێستاش زەردەشتییەکان بەرێوەی دەبەن.

بۆیان کیسەی بکێشێ و چڵکی لابا، ئەگەر دەست بخاتە ژێر پۆشەنی شەرمگایانەوە ناڕەوایە، چونکوو دەست پێدا هەنوون وەکوو دیتنە. دیمەنی ئاژەڵ بەسەر دیواری گەرماودا حەرامەو یا دەبێ بیسڕێتەوە، یا خۆ دەبێ بێتە دەرەوە.

دەست و دەفر و لەگان دەئاو رۆ کردن، بەپێی بۆچوونی شافیعی حەرامە، کەچی بە گوێرەی بۆچوونی مالکی رەوایە. زێدەڕۆیی لە رژاندنی ئاو، کرێتە.

**مونکەراتی میوانی**

رایەخی ئاوریشمی و تەبەق و گوڵاودانی زێری و زیوین، میسکدان و پەردەی هەڵواسراو کە نەخشی روومەتی لە سەردا بێ -نەخشی روومەت لەسەر رایەخ و سەرین رەوایە- و هەروەها گوڵاودانێ کە نەخشی ئاژەڵی بە سەردا کێشرابێ، دزیوە. گوێڕاگرتن بۆ گۆرانی و ساز و عوود و سەیرکردنی ژنانی لاو بۆ پیاوانی لاو، چاندنی تووی گوناحە و بەرگری لەم کارە، فەرز و پێویستە؛ ئەگەر پێی نەکرا دەبێ لەوێ بێتەدەر. ئەحمەدی حەنبەل لە میوانیدا کلدانێکی زیوینی بینی و لەوێ هەستا و هاتەدەر. لە میوانیدا نابێ لە لای پیاوێ کە بەرگی ئاوریشمین یا ئەنگوستیلەی زێڕی لە دەستدا بێ، دابنیشی. ئەگەر منداڵێکی پێگەیو بەرگی ئاوریشم دەبەرکا، نابێ لە لای وی دانیشی؛ بەرگی ئاوریشم بۆ کوڕ و پیاوی موسوڵمان حەرامە، وەکوو خواردنەوەی شەراب؛ چونکوو رەنگە خووی پێ بکا و لە دواییدا وازی لێ نەهێنێ. ئەگەر پێنەگەیشتبوو و چێژی هەست پێ نەدەکرد، مەکرووهە، بەڵام نابێ گەیشتبێتە ئاستی تەحریم.

ئەگەر لە میوانیدا زەلامێ بە گاڵتە و قەشمەری و درۆ خەڵک بێنێتە پێکەنین، دانیشتن لەو کۆڕەدا ناڕەوایە.

شرۆڤەی خراپەکاری گەلێک دوور و درێژە. کە لەمانەی بێژرا گەیشتی، بۆ خۆت لە خراپەکاری قوتابخانە و کۆڕی حکوومی و دیوانی پادشایان بیرکەوەو بیياننناسە.

## بنه‌مای ده‌هه‌م - حوکمڕانی و حوکمداری

بزانه که حوکمڕانی کارێکی ئێجگار گه‌وریه و ئه‌گه‌ر به‌داد و عه‌دڵ بێ، بریکاری په‌روه‌ردگاره و ئه‌گه‌ر به ستەم و زوڵم بێ و له هه‌رچی داده بێبه‌ر بێ، جێگری و بریکاری شه‌یتانه؛ چونکه هیچ گه‌نده‌ڵییه‌ک خراپتر له سته‌می حوکمڕان نییه.

نیازی حوکمداری، زانین و کرده‌یه:

زانینی حوکمڕانی، دوور و درێژه. مه‌به‌ست له‌و زانستانه ئه‌وه‌یه که حوکمڕان ده‌بێ بزانێ بۆچی هاتووه‌ته ئه‌م جیهانه، جێی گرسانه‌وه‌ی هه‌تا هه‌تایی له کوێیه؛ دونیا هه‌وارگه‌یه، نه‌ک جێی هه‌تاهه‌تایی. ئه‌میش وه‌کوو رێبوارێکه که سه‌فه‌ری دونیای له پزدانی دایکیه‌وه ده‌ست پێ ده‌کا و له نێو قه‌بردا دوایی دێنێت، به‌ڵام نیشتمانی هه‌تایی، له سه‌رووی ئه‌مانه‌یه؛ هه‌ر ساڵ و مانگ و رۆژێ که له ته‌مه‌نی راده‌برێ، قۆناغێ له‌و ماڵه‌ی نزیک ده‌که‌وێ. ئه‌وه‌ی رێگای خانووی له‌سه‌ر پرد بێ، که له‌سه‌ر پرد په‌رژایه سه‌ر خانوو سازکردن و له ماڵی خۆی بێ ئاگا که‌وت، بێ ئاوه‌زه. ژیر و لێهاتوو ئه‌وه‌یه که له‌م هه‌واره بێجگه له توێشووی دوارۆژ چیدی هه‌ڵنه‌گرێ و بێجگه له‌وه‌ی نیازی پێیه، ئاوڕ له چیتر نه‌داته‌وه و به ژاری ژین‌بڕی بزانێ. له سه‌ره‌مه‌رگدا باش تێده‌گا که هه‌موو گه‌وره‌یی و شان‌وشکۆی ئه‌م دونیایه، پووله ره‌شێ ناکا و هیچ به‌هره‌ی پێ نادا؛ فره‌تر له نیازی، هه‌رچی کۆ کاته‌وه -چونکه هیچ که‌ڵکی لێ نابا و به‌هره‌ی پێ ناگا- ده‌بێته گه‌رای هه‌ناسه‌ساردی و نسک و ناهمێ بوون و په‌ژیوانی و له ده‌می گیانه‌لادا، گیان به دژوار ده‌داته ده‌سته‌وه. ئه‌مه له کاتێکایه که سامانی حه‌ڵاڵ بێ؛ که‌واته ئه‌گه‌ر حه‌رام بوو، سزای دوارۆژی گه‌لێک له‌وه زۆرتره.

به‌بێ ره‌نج و ئازار، که‌س ناتوانێ خۆی له ئاره‌زووی دونیا بپارێزێ. به‌ڵام که بڕوا راست و دروست و پته‌و بێ -به‌هۆی ئه‌م چه‌ن رۆژه ژیانی پڕده‌ردی‌سه‌ر و ره‌نج و ئازاره‌وه، چێژ و خۆشی دوارۆژ به خه‌سار ده‌چێ، ئه‌و ژینه پادشاییه‌کی هه‌تاهه‌تاییه و هیچ ئاژاوه‌یه‌کی تێدا نییه- که بڕوا راست و

دروست و پتەو بێ[1]، چەن ڕۆژێ بەکاوەخۆ بوون ئاسانە. هەر وەکوو ئەوەی کەسێک گراوێکی بێ و پێێ بڵێن: «گەر ئەمشەو توخنی کەوی، ئیدی هەتاهەتایە نایبینی؛ بەڵام ئەگەر دان بە دڵی خۆتدا بنی، هەزار شەو بەبێچاودێر و پاسەوان، هی خۆتە». هەر چەن ئەو کەسە ئاگری ئەڤینی لە دڵ هەڵکرابێ، بۆی ئاسانە بە هیوای هەزار شەو، یەک شەو خۆی ڕابگرێ. دەسا خۆ درێژایی دونیا یەک لە هەزاری تەمەنی دوارۆژیش نییە، بەڵکوو قەد پێکەوە لە پێوانە نادرێن؛ چونکە دوارۆژ هەتاهەتایە و هەتاهەتاش لە بیری مرۆڤدا ناگونجێ؛ ئەگەر وابیر کەیتەوە کە زەوین و حەوت ئاسمان پڕ لەگارس بێ و مەلێ هەر هەزار ساڵ دانێکی لێ هەڵبگرێ، ئەو گارسە دوایی دێ و هیچ لە ئەبەد کەم نابێتەوە. تەمەنی مرۆڤ، ئەگەر سەدساڵ بێ و سەرلەبەری دونیای لە ژێر ڕکێفدا بێ، لە بەرانبەر پادشایی دوارۆژدا کە هەتاهەتاییە، چ بایەخێکی هەیە؟ بەڵام هەرکەس لە دونیا کەمووکێ بەشی هەیە و ئەو کەمەش پڕ لە زووخ و دەردە و زۆر مرۆڤی بێفەڕ هەیە لەو شتەدا زۆرتریان هەیە. جا کەوابوو چ شتێ دەبێتە هۆی ئەوەی شانی ئەو ژینە پڕ لە ژانەی دوابڕاوی بێفەڕە بدرێتە سەر ژیانی پادشایی هەتا هەتایی دوارۆژ؟

دەسەڵاتدار و خەڵکی ئاسایی دەبێ ئەم واتایە بە دڵ هەست پێ بکەن تا پشوودرێژییان لەبەر سانا بێ و بە ئاسانی خۆ لە هەمبەر شاوەتی دونیا ڕاگرن و سەری بۆ نەوی نەکەن و لە بەرانبەر هەژار و نەدار و خەڵک و خوادا پڕبەزەیی و دڵ نەرم و بەکاوەخۆ بن و جێگرێکی شیاو و لە باری پەروەردگار بن لەسەر زەویدا. کە ئەمەی زانی، دەبێ بپەرژێتە سەر بەڕێوە بردنی کاروباری دونیا، ئەوەش بەو جۆرەی خودا فەرموویە، نەک بەو چەشنەی خۆی حەزی لێیە؛ چونکە هیچ عیبادەتێ لە لای پەروەردگار هێژاتر لە حوکمداریکردنی دادوەرانە نییە. پێغەمبەر فەرمووی: «یەک ڕۆژ دادوەری پادشای دادوەر، هێژاترە لە شەست ساڵ بەندەگی بەردەوام». لەو حەوت کەسەی کە لە ڕۆژی پەسڵاندا لە ژێرسای پەروەردگارن، یەکەم کەسیان خونکاری دادوەرە. دیسان فەرمووی: «هەموو ڕۆژێ کردەی شەست زانای ڕاسبێژی ڕاسکار بۆ پادشای دادوەر دەنووسرێ و هەواڵی دەگاتە ئاسمان». هەروەها: «دۆستترین و نزیکترین کەس بە پەروەردگار، ڕێبەری دادوەرە و دوژمنترین و نەگونجاوترینی خەڵکی لە لای خوا، خونکاری ستەمکارە». دیسان فەرمووی: «سوێند بە پەروەردگارێ کە گیانی محەممەدی لە دەستدایە، هەموو ڕۆژێ بە قەدەر چاکەکاری خەڵکی ژێر دەسەڵات، هەواڵی کردەی چاکی پادشای دادوەر دەگاتە ئاسمان و هەر نوێژێکی بە حەفتا هەزار نوێژ

---

[1] - دووپات کردنەوەی «کە [illegible] ...دەست و پتەو بێ» بە بۆنەی درێژ بوونی باسی چۆنییەتی ئیمان و بڕواوە کە لە نێوان دوو هێڵدا دانراوە، هاتووە.

بۆی دەنووسرێ». کەواتە، چ دەسکەوتێ پتر لەوەیە کە پەروەردگار پاگەیەک بداتە کەسێک کە یەک دەمی تەمەنی بەرانبەر بێ لەگەڵ هەموو تەمەنی خەڵکی‌تر. ئەوەش نرخی ئەم پاگە نەزانێ و بپەرژێتە سەر ستەمکاری و ڕەدووی داخوازی نەفسی کەوێ، ئاشکرایە کە شیاوی دوژمنی پەروەردگارە.

**دادوەری بە لەبەرچاو گرتنی ئەم دە بنەمایە پێک دێ:**

**بنەمای یەکەم،** لە هەر ڕووداوێک کە دێتە گۆڕێ، وابیر کاتەوە خۆی مرۆڤێکی ڕەمەکییە و خەڵکی پادشان. هەرچی بۆ خۆی پەسند ناکا، بۆ خەڵکوخواش پەسندی نەکا؛ ئەگەر بۆ خەڵکی پەسندی کرد و بۆ خۆی نە، ئەوە توخمان و خیانەتی کردووە لە حکوومەتدا. ڕۆژی شەڕی بەدر پێغەمبەر لە سای کەپرێ دانشتبوو. جوبرەئیل هات و گوتی: «تۆ لە سا و یارانت لەبەر هەتاون» بۆ ئەم نەختە جیاوازییە، خوا لۆمەی کرد.

پەیغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس دەیهەوێ لە جەحەننەم رزگار بێ و بە بەهەشت شاد بێ، دەبێ کاتی پێمێرد هاتە سەروەختی، لەسەر پەیڤی "لا الهَ الاّ الله"ی ببینێ و ئەوەش بۆ خۆی پەسندی نەکا، بۆ هیچ موسوڵمانێ پەسندی نەکا». دیسان فەرمووی: «ئەوەی بەیانی لە خەوڕابێ و نیازی بەندەگی خودای نەبێ، پیاوی خودا نییە و گەر ئارەزووی دەرمانی دەردی موسوڵمانانی نەبێ، لە موسوڵمانان نییە».

**بنەمای دووەم،** نابێ بە چاوێکی سووک سەیری نیازمەندانی بەر دەرگای کاو دەبێ خۆی لەو مەترسییە بپارێزێ. تا موسوڵمانێ نیازێکی هەیە، نابێ بپەرژێتە سەر هیچ سوننەتێ؛ چونکە پێکهێنانی کاری خەڵکی لە نوێژی سوننەت پێویستتر و هێژاترە. ڕۆژێک عومەری عەبدولعەزیز خەریکی جێبەجێ‌کردنی کاری خەڵکی بوو تا کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات. زۆر ماندوو بوو، ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ نەختێ بحەسێتەوە. لەپڕ یەکێک پێێ گوت: «ناترسی لەم کاتەدا کە خەریکی پشوودانی و بەندەکانی خوا چاوەڕوانی تۆن تا کاروباریان بۆ پێک بێنی و مردن بێتە دیارتەوە؟» گوتی: «ڕاست دەڵێی». دەم و دەس هەستا و ڕۆیشتە دەرەوە.

**بنەمای سێهەم،** خۆی فێر نەکا بپەرژێتە سەر پێکهێنانی ئارەزووەکانی نەفسی، وەکوو دەبەرکردنی جلکی جوان و خواردنی خۆراکی خۆش. لە هەموو شتدا دەبێ قنیات کا؛ چونکە دادوەری بەبێ قنیات کردن قەد پێک نایێ.

عومەری خەتتاب لە سەلمانی پرسی: «چت بیستووە لە بارودۆخی من کە پێت دزێو بووبێ؟» گوتی: «بیستم بە جارێک دوو جۆر خۆراکت لەسەر خوانت راناوەو دوو بەرگت هەیە، یەکیان شەو

دەبەر دەکەی، یەکیان رۆژ». گوتی: «بێجگە لەمە چیدی نییە؟» گوتی: «نە». گوتی: «لەمە بەدوا ئەمەش نابێ».

**بنەمای چوارەم،** تا پێی دەکرێ کاروباری بە دلۆڤانی راپۆڕێنێ نەک بە توندی و بە زۆر. پەیغەمبەر فەرمووی: «هەر حوکمداری لە گەڵ خەڵکی دلۆڤان بێ، رۆژی پەسڵان لەگەڵی میهرەبان دەبن». گازەی دەکرد و دەیگوت: «پەروەرندەم! هەر خونکارێ لەگەڵ خەڵکی میهرەبانە، تۆش لەگەڵی دلۆڤان بە. ئەوەش بە تووڕەیی لەگەڵ خەڵک دەدوێ، تۆش لەگەڵی تووڕە بە». دیسان فەرمووی: «جوان ئەوەیە کە پادشایی و دەسەلاتداری بدرێتە کەسێ کە بە راستی جێبەجێی کا و خراپ ئەوەیە کە پادشا لە کاری خۆی کورتی بکا».

هیشام کوڕی عەبدولمەلیک لە خەلیفەکان بوو، لە ئەبووحازم -کە زانایەکی گەورە بوو- پرسیاری کرد: «رێگای بە ساغی خەلسین لەم ئەرکە چییە؟» گوتی: «ئەوەیە کە هەر درهەمێ کە وەریدەگری لە شوێنێکی حەلالەوە بێ و لە جێگایەکی خەرج کەی کە رەوابێ». گوتی: «کێ ئەم کارەی پێ دەکرێ؟» گوتی: «ئەوەی توانی جەحەندەمی نەبێ و حەزی لە بەهەشت بێ».

**بنەمای پێنجەم،** دەبێ هان بدا تا خەڵک و شەرع لیێ رەزابن. پەیغەمبەر فەرمووی: «چاترینی رێبەران ئەو کەسانەن کە ئەنگۆیان خۆش دەوێ و ئێوەش ئەوانتان خۆش دەوێ. خراپترینیش ئەو کەسانەن کە بە دوژمنتان دەزانن و ئێوەش ئەوان بە دوژمن دەزانن؛ ئێوە ئەوان لەحنەت دەکەن و ئەوانیش ئێوە». خونکار نابێ بەوە لووتبەرز بێ کە هەرکەس پێی دەگا پەسنی دەکاو بە بالایدا هەڵدەڵێ؛ هۆی ئەو پەسنانە ترسە، نەک خۆشەویستی؛ بەڵکوو دەبێ باوەڕپێکراوانی خۆی بنێرێتە نێو خەڵک تا بتۆژنەوە و بزانن خەڵک لیێ رەزان یا نە.

**بنەمای شەشەم،** نابێ بە ئاوەژووی شەرع بۆ رەزای کەسێک هان بدا. ئەوەی لە دژایەتی لەگەڵ شەرع نارەزا بێ، ئەو نارەزایەتییە هیچ زیانی بۆ نییە. عومەر گوتی: «هەر رۆژ کە لە خەو رادەبم، نیوەی خەڵکی لێم زیزن». بێگومان ئەوەی دادی کەسیتری لێ دەسێنن، نارەزایە؛ کەواتە ناکرێ هەر دوولایەنی شەڕ رەزابن. دیسان گوتی: «گێل و نەزان ئەو کەسەیە بۆ رەزای خەڵکی چش لە رەزای پەروەرندەی کا».

مەعاوییە نامەیەکی بۆ عایشە نووسی و گوتی: «ئامۆژگارییەکم کە». عایشە نووسی: «لە پەیغەمبەری خودام ژنەفت کە هەرکەس بۆ ئەوەی خودای لێ خۆش بێ، خەڵکی لە خۆ زویر کا، خودای لێ رەزا دەبێ و خەڵکیشی لێ خۆش دەکا؛ ئەوەش خەڵک لە خۆی خۆش کا و خودا لە خۆی زیز کا، خودا لیێ نارەزا دەبێ و خەڵکیشی لێ زویر دەکا».

**بنەمای حەوتەم،** دەبێ بزانی مەترسی وڵاتداری گەلێک زۆرە و کاری خەڵکی لە ئەستۆ گرتن زۆر

دژوارە و ئەوەی لە پێکهێنانی ئەم کارەدا سەرکەوت، بەختەوەرییەکی دەست دەکەوێ سەرتر و هێژاتر لە هەموو بەختەوەرییەک؛ بەلام گەر تووشی کورتی و هەلە بوو، چارەڕەشییەکی تووش دێ رەشتر لە هەر چارەڕەشییەک.

ئیبنی عەبباس دەلێ: «رۆژێ پەیغەمبەرم بینی کە لە دوورەوە هات و ئالقەی دەرگای کەعبەی گرت. تاقمێ لە قورەیش لەو دێو بوون. پێی گوتن: "رێبەرو پادشایان لە قورەیشن تا سێ کار پێک بێنن: یەکەم ئەوەی ئەگەر داوای بەزەییان لێکردن بە بەزەیی بن؛ ئەگەر دەستووریان لێ خواستن، دادوەر بن؛ هەرچی بلێن جێبەجێی کەن. هەرکەس وای نەکرد، بکەوێتە بەر لەحنەتی خودا و فریشتەکان و نووکوبەدی خەلک. پەروەردگار نە فەرزی لێ وەردەگرێ و نە سوننەت». کەواتە: بزانە چ کارێکی گەورەیە کە لە سۆنگەی ئەوەوە هیچ عیبادەتت لێ وەرناگیرێ؛ نە فەرز و نە سوننەت».

پەیغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس لە نێوان دوو کەسدا دادوەری کا و ستەم کا، لەحنەتی خودا لە ستەمکاران». دیسان گوتی: «خوا لە رۆژی پەسلاندا بە سێ کەسدا ناڕوانی: خونکاری درۆزن، پیری زیناکار و دەرۆزەی شاتوشووتکەر و لووتبەرز».

بە یارانی گوت: «زۆری نەماوە کە رۆژهەلات و رۆژاوا بێتە ژێر رکێفتان؛ هەموویان لە نێو ئاوردا بن، بێجگە ئەوەی لە خوا دەترسێ و پارێزکارە و ئەمانەتی خەلک دەگێڕێتەوە بۆ خێوەکانی». دیسان فەرمووی: «هیچ مرۆیەک نییە کە خودا بیکاتە گەورەی کەسانێک و دەگەلیان زەغەل کاو بەزەیی بۆیان نەبێ و ئامۆژگاریان نەکا و پەروەردگار بەهەشتی بۆ حەرام نەکا». هەروەها گوتی: «هەرکەس کرایە سەرۆکی موسولمانان، کەچی وەکوو خێزانی خۆی ئاگای لێیان نەبوو، بلێن جێگات لە دۆژەهدا ببینەوە». هەروەها: «دوو کەس لە نەتەوەی من لە تکای من بێ بەش دەبن: خونکاری ستەمکار، داهێنەرێ کە لە دیندا لە ڕادە بە دەر زێدەڕۆیی کا». دیسان گوتی: «دژوارترین ئازاری دوارۆژ، هی سولتانانی ستەمکارە». هەروەها فەرمووی: «خودا لە پێنج کەسان زۆر تووڕەیە، گەر بیهەوی هەر لەم دونیایە سزایان دەدا و گەریش بیەوێ لە ئاوری دۆژەهیان دەهاوێژێ: یەکەم ئەمیری هۆزێک کە مافی خۆی لێیان دەسێنێ، بەلام لەگەلیان دادوەر نییە و لە ستەم لێکردنیان هیچ شەرم نییە؛ دووەم سەرۆکی هۆزێک کە هەموویان گوێڕایەلین، کەچی ئەم وەکوو یەک سەیری ورد و درشت، داراونەدار ناکا و بە دلی خۆی دەپەیڤێ؛ سێهەم پیاوێ کە ژن و مندالی بۆ بەندەگی پەروەردگار دنە نەدا و ئەرکی دینییان پێ فێر نەکا و هیچ نەترسێ لە کوێڕا خواردنیان بۆ دابین دەکا؛ چوارەم پیاوێ کە کرێکارێ بگرێ و کاری بۆ دوایی بێنێ، کەچی پارەکەی بە تەواوی پێ نەدا؛ پێنجەم پیاوێ کە لە مارەیی ژنەکەیدا، ستەمی لێ کا».

ڕۆژێ عومەر ویستی بەسەر تەرمێکدا نوێژ کا. پیاوێ دەستی دابەرەوە و نوێژی کرد. پاش ئەوەی تەرمەکەیان ئەسپەردە کرد، دەستی لەسەر قەبرەکەی ناو گوتی: «پەروەرندەم! ئەگەر ئازاری بدەی، ڕەنگە لە هەمبەر تۆ سەربزیو بووبێ، گەر بەزەییت پێیدا بێتەوە، نیازمەندی دلۆڤانیتە. خۆزگەت پێ ئەی پیاو! چونکە نە قەد ئەمیر بووی، نە سەرۆک و نە نووسەر و نە بەرپرس و نە پیتاک وەرگر»، پاشان لە چاوان بزر بوو. عومەر گوتی، بیبیننەوە، نەیاندیەوە. گوتی: «ئەوە خزر بووە».

پێغەمبەر فەرمووی: «وای لە ئەمیران! وای لە بەرپرسان! وای لە ئەمانەتدارانی توخمان! ئەمانە کەسانێکن کە لە دوارۆژدا دەیانبینی کە بە پرچیانەوە هەڵواسراون و لە ئاسمانەوە دەراڵەکۆچن[1] و لە دونیادا قەد ئەرکەکانی خۆیان بەجێ نەهێناوە».

دیسان فەرمووی: «هیچ پیاوێ نییە کە ببێتە سەرۆکی دە کەس و لە ڕۆژی پەسڵاندا لە نێو کۆت و زنجیردا نەیهێنن؛ گەر ئاکار چاک بوو، ڕزگار دەبێ و ئەگەر نەبوو زنجیرێتری لێ زیاد دەکەن».

عومەری خەتتاب گوتی: «وای لە خونکاری زەوی لەو ڕۆژەی کە خونکاری جیهان سەیری دەکا، مەگین ئەوەی دادوەر بووبێ و مافی ڕەوای خەلکوخوای دابێ و بە گوێرەی نەفس نەجووڵابێ و سەرنجی بە لای خزمان نەبووبێ و لە ترس یان تەماح فەرمانی نەگۆڕابێ و کتێبی خودای کردبێتە ئاوێنەیەک و لە پێشی خۆی ڕاینابێ و بەرێژەی ئەوە دەستووری دابێ».

پەیغەمبەر فەرمووی: «ڕۆژی پەسلان سەرۆکان دێنن و پێیان دەڵێن: "ئەنگۆ شوانی مەڕەکانی ئێمە بوون، خەزانەداری زەوی بوون، بۆچی کەسێکتان حەد لێدا پتر لەوەی ئێمە گوتمان؟" دەڵێن: "خوایا! لە ڕقی ئەوەی دژایەتیان لەگەڵت کرد". دەڵێ: "بۆ دەبی ڕقی ئەنگۆ لەرقی من پتر بێ؟" و بە ویتر دەڵێ: "بۆچی حەدی سزادانت کەمتر لەوەی من گوتم، لێدا؟" دەڵێ: "خوایا! بەزەییم پێیداهاتەوە". دەڵێ: "بۆ دەبێ لە من پتر دلۆڤان بی؟" دەڵێ: ئەوانەی کەمتر و ئەوانەی زۆرتر لە فەرمانی من حەدیان لێدابێ، بیانگرن و سووچەکانی جەحەنەمیان لێ بئاخنن».

حوزەیفە گوتی: «قەد پەسنی هیچ خونکارێ ناکەم، چاک بێ یان خراپ». گوتیان: «بۆچی؟» گوتی: «چونکە لە پێغەمبەرم ژنەفت کە لە ڕۆژی پەسلاندا نووکوبەدی سەرۆکان دێنن و هەموویان لەسەر سیرات دادەنێن؛ پەروەردگار لە سیرات ئەمر دەکا تا هەموویان پەرژ و بڵاو کا، چونکە هەرکەس لە حوکمدا ستەمی کردبێ یا خۆ بەرتیلی ئەستاندبێ، یاخۆ زۆرتر گوێی بۆ لایەنێکی شەڕ شل کردبێ، هەموو دەکەون و دوڕۆنە دۆژهـتا حەفتا ساڵ، تا ئەوەی هەرکەس دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی».

---

[1] دەراڵەکۆچ: ئاوێزان، سەرنخوون ڕاگیراو.

لە خەبەردا هاتووە کە: «هەموو شەوێ داوود لە بیچمی لاپرەسەنێکدا دەهاتە نێو شار و لە خەڵکی پرسیاری دەکرد کە داوود چ پیاوێکە؟ جارێک جوبرەئیل لە قەوارەی زەلامێکدا خۆی پێ نواند، پێیێ گوت: "چاک پیاوێکە و چ عەیبی نییە؛ بێجگە ئەوەی لە بەیتولماڵ دەخوا نەک رەنجی شان و باهۆی". گەڕایەوە و بە کوڵ دەگریا و دەپاڕایەوە کە "خوایا! پیشەیەکم پێ فێرکە تا لە رەنجی شانی خۆم بخۆم". پەروەردگاریش زرێ چنینی پێ فێر کرد».

عومەری خەتتاب، شەوانە بۆ خۆی لە جیێ پاسەوان بە شاردا دەسووڕایەوە تا لە هەر کوێ کەمایەسییەکی دی، خێرا چاری کا. گوتی: «ئەگەر مەڕێکی گەڕ لە لای فورات دانێن و رۆنی پێدا نەماڵێن، زۆر دەترسم لە سۆنگەی ئەوەوە لێم بپرسنەوە»، لە سەرینی ئەوەی کە پارێزکاری و دادگەری عومەر بە چەشنێک بوو کە کەس پێیێ رانەدەگەیشت.

عەبدوڵلای کوڕی عەمرو کوڕی عاس گوتی: «لە خودا پاڕامەوە کە لە خەودا عومەر ببینم. پاش دوازدە ساڵ لە خەودا بینیم. پرسیارم کرد: "ئەی ئەمیری باوەڕداران! پەروەردگارت چۆن بینی؟" گوتی: "ئەی عەبدوڵلا! چەن ماوەیە کۆچم کردووە؟" گوتم: دوازدە ساڵ. گوتی: "تا ئێستا لێمیان پرسیوەتەوە؛ زۆری نەمابوو بفەوتم، بەڵام پەروەردگار زۆر دلۆڤانە"». باردۆخی عومەرواببووە کە لە هەموو ماڵی دونیا بێجگە قەمچییەک، چیتری نەبوو.

بوزورگمیهر نوێنەرێکی نارد تاکوو بزانێ عومەر چ پیاوێکە و چلۆن دەژی. کە گەیشتە مەدینە پرسی: «پادشاتان لە کوێیە؟» گوتیان: «ئێمە پادشامان نییە، ئەمیرێکمان هەیە و لە شار چۆتەدەر». رۆیشت بە شوێنیدا. لە دەرەوەی شار چاوی پێکەوت کە لەبەر هەتاو خەوتبوو، قەمچییەکەی کردبووە سەرین و ئارەقی جەمینی دەتکایە سەر خاک. کە ئەمەی دی، دڵی کەوتە لەرزەو ماوەیەک بە وردی راما و بیری کردەوە کە: ئەوەی دونیا لە بیستنی ناوی، گیانی دەلەرزێ کەچی خۆی بەم چەشنە دەژی. گوتی: «دادوەرانە حوکداریت کردووە، بۆیە بەو هێمنیە نوستووی؛ خونکاری ئێمە ستەمکارە، کەچی لە ترسا خەو لە چاوی ناکەوێ. شایەتی دەدەم کە دینی ئێوە راستە. گەر وانەبوایە کە بۆ نوێنەرایەتی هاتووم، هەر ئێستا موسوڵمان دەبووم، بەڵام پاش ئەمە دەگەڕێمەوە».

کەواتە، مەترسی سەرۆکایەتی ئەمەیەو ئەم باسەش دوور و درێژە. سەرۆک بەم جۆرە رزگاری دی کە هاومەجلیسی زانایانی باوەڕدارو دیندار بێ، تا رێی دادوەری پێ فێرکەن و گرینگی ئەم کارەی بخەنەوە بیر.

**بنەمای هەشتم**، دەبێ هەردەم تینووی دیداری زانایانی دیندار و ژنەوتنی پەند و مۆچیارییان بێ و لە دیداری زانایانی دونیادۆست و خاپێنەر کە بە ناز و پەیڤی رازاوە پەسنی دەکەن و بە بالایدا هەڵدەڵێن تاکوو لە مردار و حەرامی دونیا کە لە دەستی دایە و بە فێڵ و گزی شتێکیان بەرکەوێ،

خۆ ببوێرێ.

زانای دیندار ئەو کەسەیە کە چاوی لە سامانی نەبێ و پەندی پێ بڵێ؛ هەروەک شەقیقی بەڵخی ڕۆیشتە لای هاروونەڕەشید. هاروون گوتی: «تۆ شەقیقی پارێزکاری؟» گوتی: «شەقیق منم، پارێزکار، نە». گوتی: «ئامۆژگاریم کە». گوتی: «پەروەردگار تۆی لە جێگای سدیق دانا و ڕاستی و دۆستی لێت دەوێ، هەروەک لەوی خواست؛ تۆ لە جێی فارۆق دانا و جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاستی لێت دەوێ، هەروەک لەوی خواست؛ تۆی لە جیێ زیننورین دانا و شەرمی لێت دەوێ، هەروەک لەوی خواست؛ تۆی لە جیێ عەلی داناو داد و زانستی لێت دەوێ، هەروەک لەوی خواست». گوتی: «زۆرترم پێ بڵێ». گوتی: «بینایی چاوان خانوویەکی هەیە بە ناوی دۆژەهـ تۆی کردۆتە دەرگەوانی ئەو خانووە و سێ شتی پێت داوە: سامانی بەیتولماڵ، شیر و قەمچی و گوتوویە: بەم سێ شتە خەڵک لە دۆژەهـ بگێڕەوە. هەر نیازمەندێ کە هاتە لات، ئەم سامانەی لێ درێخ مەکە و هەرکەس دژایەتی لەگەڵ فەرمانی خودا کرد، بەم قەمچییە بیگێڕەوە و هەرکەس بە ناڕەوا کەسێکی کوشت، بەم شمشێرەو لەسەر خواستی خودانی وی، گیانی بگرە. گەر واتـنەکرد، بۆ ڕۆیشتنە دۆژەەتۆ پێشڕەوی و کەسانیتر لە دوای تۆن». گوتی: «زۆرترم پەند پێ بدە». گوتی: «تۆ کانیاوی و کەسانیتر جۆگەن، ئەوانەی دەست و پێوەندی تۆن. گەر کانیاو روون بێ، لێڵی جۆگە هیچ زیانی نییە، بەلام کە لیل بوو، پاکژی جۆگە هیچ کارێ ناکا»».

هاروونەڕەشید دەگەڵ عەباس -یەکێک لە دەست و پێوەندەکانی- پێکڕا ڕۆیشتنە لای فوزەیلی عەییاز. کە گەیشتنە بەر دەرکی خانووی، فوزەیل قورئانی دەخوێندو گەیشتبووە ئەم ئایەتە: أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ[1]. گوتی: «گەر پەندم دەوێ، ئەم ئایەتەم بۆ بەستە». واتای ئەم ئایەتە ئەوەیە کە ئەوانەی خراپە دەکەن کەچی پێیان وایە ئێمە لەگەڵ ئەو کەسانەی چاکەکارن و بڕوایان هێناوە هاوشانیان دەگرین، بە هەڵەدا ڕۆیشتوون. گوتی: «تەقە بدە». عەبباس دەرگاکەی کوتا و گوتی: «دەرگا کە بکەرەوە بۆ ئەمیری باوەڕداران». گوتی: «ئەمیرەلمۆئمنین لە لای من چ دەکا؟» گوتی: «ڕێزی ئەمیر بگرە و دەرگەکەت بکەرەوە». دەرگاکەی کردەوە. شەو بوو، چراکەی کوژاندەوە. هاروون لە تاریکیدا دەستی دەهەنوو تا دەستی دای لە فوزەیل گوتی: «ئای لەم دەستە چەندە نەرمە، گەر لە ئازاری پەروەردگار رزگار بێ!». پاشان گوتی: «ئەی ئەمیرەلمۆئمنین! پەرسڤی خودا

---

١- قورئان، ٢١/٤٥.

ئامادە کە، ڕۆژی پەسلان لەگەڵ یەک بەیەکی موسوڵمانان ڕاتدەنێن و لێت دەپرسنەوە». هارون دایە پرمەی گریان. عەبباس گوتی: «بێدەنگ بە! ئەمیرت کوشت». گوتی: «ئەی هامان[1]! تۆ و هۆزەکەت کوشتتان، بە من دەڵێی وس بە؟» هاروون گوتی: «بۆیە پێت دەڵێ هامان، من بە هاوشانی فیرعەون دەزانێ». پاشان هەزار دینار بۆ دانا و گوتی: «ئەمە لە حەلاڵە، لە مارەیی دایکمە». گوتی: «دەپێت دەڵێم ئەوەی هەتە وازی لێ بێنەو بیدەرەوە بە خێوی خۆی، کەچی تۆ بە منی دەدەی!». هەستا و ڕۆیشتە دەرەوە و وەرینەگرت.

عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بە محەممەدی کوڕی کەعبی گوت: «تایبەتمەندییەکانی دادوەریم پێ بڵێ». گوتی: «هەرکەس لە موسوڵمانان لە تۆ منالترە، بابی بەو گەر لە تۆ گەورەترە، کوڕی بە و هەرکە وەک خۆتە برای بە. سزای هەرکەس بە قەدەر تاوانی بدە و ئامان بە تووڕەییەوە قەمچی لەکەس نەدەی، چونکە دۆژەهـ دەبێتە مەنزڵگات».

یەکێک لە پارێزکاران ڕۆیشتە لای خەلیفەی سەردەم. خەلیفە گوتی: «ئامۆژگاریم کە». گوتی: «لە سەفەری چیندا بووم. خونکاری ئەو وڵاتە گوێی کەڕ ببو؛ بەکوڵ دەگریا و دەیگوت: "بۆ ئەوە ناگریم گوێم کەڕ بووە، بۆ ئەوەی دەگریم، هەژاران لەبەر دەرگام کۆوە دەبن و هاوار دەکەن و گاسم دەکەن، بەلام من نایژنەوم. بەلام چاوم دەبینێ، جاڕ بدەن هەرکەس گیر و گرفتێکی هەیە، بەرگی سوور دەبەرکا". کە وای گوت، هەموو ڕۆژێ سواری فیل دەبوو و لە کۆشک دەهاتەدەر، هەرکەس جلکی سووری لەبەر بوو، گاسی دەکرد و لە دەردی دڵی دەپرسیەوە. ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئەوە کافرێ بوو کە بەم چەشنە خۆشەویستی پەروەردگاری لە دڵدا بوو، تۆ باوەڕداری و لە بنەماڵەی پێغەمبەری، بە خۆدا بچۆرەوەو بزانە دلۆڤانی تۆ چەندە».

ئەبووقێلابە ڕۆیشتەلای عومەری عەبدولعەزیز. عومەر گوتی: «پەندێکم پێ بدە». گوتی: «لە ڕۆژگاری ئادەمەوە تاکوو ئەمڕۆ هیچ خەلیفەیەک نەماوە بێجگە لە تۆ». گوتی: «زۆرترم پێ بڵێ». گوتی: «یەکەم، خەلیفەیەک کە دەمرێ تۆی». گوتی: «زۆرتر». گوتی: «ئەگەر پەروەردگارت لە گەڵدایە، لە چی دەترسی؟ ئەگەر لەگەڵت نییە، هیوات بە کێیە؟» گوتی: «ئەمەی گوتت بەستە بۆم».

سلەیمانی عەبدولمەلیک خەلیفە بوو. ڕۆژێ ڕاما و گوتی: «لەم دونیایەدا زۆرم ڕابوارد، دەبێ دوارۆژ حاڵم چۆن بێ؟» یەکێکی ناردە لای ئەبووحازم (یەکە زانا و پارێزکاری سەردەم بوو) و گوتی: «لەو شتەی ڕۆژووی پێ دەکەیتەوە بۆم بنێرە». نەختێ سوەی کوڵاوی بۆ نارد و گوتی: «شەوان لەمە دەخۆم». سلەیمان کە ئەوەی بینی، زۆری بەسەر دڵدا کار کرد و بە کوڵ گریا. سێ ڕۆژ ڕۆژووی

---

[1] ـ هامان وەزیری فیرعەونی هاوچەرخی مووسا بوو کە لە قورئاندا ناوی هاتووە، لێرەدا نیزی لە عەبباس گرتووە.

گرت و هیچی نەخوارد؛ شەوی سێهەم بەوە ڕۆژووی کردەوە. دەڵێن ئەو شەوە لە لای خێزانی خەوت. لەو خەوتنە کوڕێکی بوو کە ناوی عەبدولعەزیز بوو و لە داد و عەدڵدا بوو بە تاقانەی ڕۆژگار و وەکوو عومەری خەتتاب وابوو. دەڵێن ئەوە هەمووی لە سۆنگەی ودم و خێری ئەو نییەتە جوانە و ئەو خواردنە پیرۆزە بوو.

لە عومەری عەبدولعەزیزیان پرسی: «هۆی پاشگەزبوونت لە دونیا چ بوو؟» گوتی: «شەوێ کۆیلەیەکم تەمێ دەکرد، پێی گوتم: "بیر کەرەوە لەو شەوەی بەیانیەکەی ڕۆژی پەسلانە"، ئەو پەیڤەم زۆر بەسەر دڵدا کاریگەر بوو».

یەکێک لە گەورەکان لە عەرەفاتدا هاروونەڕەشیدی بینی کە بە سەری پەتی و پێخواس بەسەر وردە بەردی داخدا ڕاوەستا بوو و دەستی هەڵبڕیبوو و دەیگوت: «پەروەرندەم! تۆ تۆیت و من منم! کاری من ئەوەیە تووشی گوناح بم، کاری تۆش ئەوەی لە گوناحم خۆش بی؛ بەزەییت پێمدا بێتەوە». ئەو پیاوە گەورە گوتی: «سەیرکەن زۆرداری زەوی چلۆن لە بەرانبەر زۆرداری ئاسمانەوە دەپاڕێتەوە».

عومەری عەبدولعەزیز بە ئەبووحازمی گوت: «مۆژیارییەکم بکە». گوتی: «لە سەر زەوی بنوەو مەرگ لە ژووری سەرت نێ؛ هەرچی پێت خۆشە لە کاتی مردندا لە لات بێ، ڕایگرەو هەرچی پێت خۆش نییە، لە خۆتی دوورکەرەوە؛ چونکە ڕەنگە مردن زۆر لێت نزیک بێ».

کەواتە، دەبێ وڵاتداران سەرنج بدەنە ئەم چیرۆکانە و ئەم ئامۆژگارییانەی کە بە کەسانیتر بێژراون، گوێ لێ بگرن. هەر زانایەک کە دەبینن داوای ئامۆژگاری لێ بکەن، هەر زانایەکیش کە ئەمان دەبینێ، دەبێ پەندی لەم چەشنەیان پێ بداو پەیڤی ڕاستەقینە نەگێڕێتەوە و پێیاندا هەڵنەلێ، چونکە لەستەمیاندا هاوبەش دەبێ.

**بنەمای نۆهەم**، دەبێ هەر بەوەی کە خۆی بە تەنیا ستەم نەکا قنیات نەکاو دەست و پێوەندەکانیشی ڕابێنێ و لە ستەمیان پاکژ کاو ئیزنی ستەمیان پێ نەدا؛ چونکە ستەمی ئەوانیشی لێ دەپرسنەوە.

عومەری خەتتاب نامەیەکی نارد بۆ ئەبووموووسای ئەشعەری -کە نوێنەری بوو- گوتی: «بەختەوەرترین سەرۆکان ئەوانەن کە خەڵکەکەیان بەختەوەرن؛ چارەڕەشترینیش ئەو کەسەیە کە خەڵک بە هۆی ئەوەوە بەخت ڕەشن. ئامان! بە فیز و دەمارەوە بەڕێدا نەڕۆی، تا دەست و پێوەندەکەشت چاوت لێ نەکەن. وێنەی تۆ وەکی ئاژەڵێکە کە گژ و گیای زۆری بینیوە و چاک لەوەڕاوەو خۆی قەڵەو کردۆتەوەو هەر ئەو قەڵەوییەش هۆی فەوتانیە، چونکە دەیکوژن و دەیخۆن».

لە تەوراتدا هاتووە کە: «هەر ستەمێ کە لە دەست و پێوەندی سوڵتانەوە بوەشێتەوەو سوڵتان

بێدەنگ بێ، سوڵتان ئەو ستەمەی کردووە و پرسیاری ئەو ستەمەی لێدەکەن». دەبێ سەرۆک چا بزانێ کە کەس ستەم لێکراو و بێ ئاوەزتر لەوەی نییە کە دین و دوارۆژی خۆی بۆ دونیای کەسێکی-تر بدۆڕێنێ. هەموو دەست و پێوەند و خزمەتگوزاران بۆ دونیای خۆیان، ستەم لەبەرچاو خونکار دەرازێننەوە و ئەو دەنێرنە دۆژەمو خۆشیان دونیا بە دەست دێنن. چ دوژمنێ خراپتر لەوەی بۆ چەن دینار بتفەوتێنێ؟ »

بە کورتی، ئەوەی دەست و پێوەندی لەسەر داد رانەگرێ، ناتوانێ بە هاوسەنگی دەگەڵ خەڵکی بجزوێتەوە. مرۆڤ تا لە دەروونی خۆیدا دادوەر نەبێ، ناتوانێ ژن و منداڵ و خولامی خۆی بۆ دادوەری هان بدا. دادوەری بریتییە لەوەی کە ئاوەز لە ستەم و شاوەت و تووڕەیی بپارێزرێ و ئەمانە بخاتە ژێر رکێفی ئاوەز و دین، نەک ئاوەز و دین بێنێتە ژێر رکێفی شاوەت و تووڕەیی. زۆربەی خەڵکی ئاوەزیان هێناوەتە بەر خزمەتی شاوەت تا گزی و فێڵێک ببینێتەوە و ئەوانیش بگەن بە داخوازیان. ئاوەز لە گەوهەری فریشتەکانە و لە لەشکری پەروەردگارە و شاوەت و تووڕەیی سوپای ئیبلیسن. ئەوەی لەشکری پەوەرەندەی بکاتە دیل و بەر دەستی لەشکری شەیتان، چۆن دادوەری لێ دەوەشێتەوە؟

کەواتە، هەتاوی دادوەری سەرەتا لە دڵدا هەڵدێ و پاشان ڕووناکی ئەو هەتاوە خاو و خێزان دەگرێتە بەر، پاشان دۆستان و نزیکان و دواتر تیشکەکانی دەگەنە خەڵکوخوا و لێی بەهرە دەبەن. هەرکەس بێ هەتاو، چاوەنۆڕی ڕووناکییە، هەر چاوەڕوانی پێ دەبڕێ و هیچی‌تر.

دادوەری لە تەواوتربوونی ئاوەزەوە دەوەشێتەوە و تەواوتربوونی ئاوەز ئەوەیە کە هەمووشتێ هەر ئەو جۆرە کە هەن ببینێ و راستەقینەی ناخی هەر شتێ ببینێ و لووت بەرزی ڕواڵەت نەبێ. بۆ نموونە رابمێنێ و بیرکاتەوە و بزانێ ئەگەر بۆ دونیا واز لە داد دێنێ، چی لە دونیا دەوێ: ئەگەر نیازی لە دونیا خواردنەوەیە، دەسا دەبێ بزانێ کە ئاژەڵێکە لە پێستی مرۆدا؛ چونکە پاپای خواردن کاری چوارپێیانە؛ ئەگەر بۆ لەبەرکردنی بەرگی ئاوریشمینە، ئەوە ئافرەتێکە لە ڕواڵەتی پیاواندا؛ چونکە ئاوریشم دەبەرکردن و خۆ خەملاندن کاری ژنانە؛ گەر دونیای بۆیە دەوێتن تا لووتی دوژمنانی بشکێنێ و بەسەریاندا زاڵ بێ و مەبەستی کوشتن و برینیانە، دەبێ بزانێ کە ئەو دڕندەیەکە لە پێستی مرۆدا؛ چونکە تووڕە بوون و کوشتن و دڕین کاری دڕندانە؛ گەر بۆ ئەوەی دەوێ تا خەڵکی کڕنۆشی لەبەر بەن و پەرای کەن، دەبێ بزانێ ئەوە گەوجەپیاوێکە لە ڕواڵەتی ژیرەپیاواندا؛ چونکە گەر ژیر بایە چاکی دەزانی ئەمانە پەرای ئارەزووی نەفسی خۆیان دەکەن و ئەمیان کردووە بە داوێ بۆ راوی داخوازەکانی نەفسیان، نیشانەکەشی ئەوەیە کە گەر بە درۆ بژنەفن دەسەڵات دراوەتە کەسێکی‌تر، چش لەم دەکەن و ئاوڕی لێ نادەنەوە و پەرای کەسێکی‌تر دەکەن و لە هەر کوێدا بۆنی

زێڕ و زیویان وەبەر کەپۆ کەوێ، لەوێ کلکە سووتەیانە.

کەواتە، لە ڕاستیدا ئەوە پەرایی نییە، بەڵکوو قەشمەری و پێکەنینە. ژیر ئەو کەسەیە کە ڕاستەقینەی کارەکان ببینێ، نەک ڕواڵەتیان. ڕاستەقینەش هەر ئەوەیە هاتە گوتن، ئەوەش پیێ وانەبێ و دانی پێدانەنێ، ژیر نییە. هەرکەسێکیش کە ژیر نەبێ، چاوەڕوانی دادوەری لێ ناکرێ و مەنزلگای دواڕۆژی دۆژەهە. لەم سۆنگەیە کە سەرۆکی هەموو بەختەوەرییەک ئاوەزە.

**بنەمای دەهەم،** ئەوەیە کە زۆربەی سەرۆکان لووتبەرزن و لە لووتبەرزی تووڕەیی دێتە دی و لە تووڕەیی تۆلەسەندنەوە.

تووڕەیی دوژمنی ئاوەزە و زیانی ویبە و دەرمانی لە کتێبی تووڕەییدا ڕاڤە دەکرێ. بەڵام کە تووڕەیی بە سەریدا زاڵ بوو، دەبێ هان بدا لە هەموو کارەکانیدا پاڵ بداتە لای بوردن و پشوودرێژی و هێوری و نەرمونیانیەوە و کە ئەم ڕەوتەی کردە پیشەی خۆی، وەکوو پێغەمبەران و ئەسحاب و پیاوچاکانە؛ کەچی ئەگەر کەوتە دووی تووڕەیی، دەبێتە وەکوو ترکان و خەڵکی گێل و نەزان کە وەکوو دڕندان دەبزوێنەوە.

دەگێڕنەوەکە ئەبووجەعفەر خەلیفە بوو؛ فەرمانی دا کابرایەک کە ناپاکی دەگەڵ کردبوو، بکوژن. موبارەک کوڕی فەزالە، لەوێ بوو، گوتی: «گەورەم! سەرەتا گوێ ڕاگرە بۆ خەبەرێ لە پێغەمبەری خودا». گوتی: «بلێ». گوتی: «حەسەنی بەسری دەگێڕێتەوە کە پەیغەمبەر فەرمووی "دواڕۆژ کە نووکوبەدی خەڵکی لە سارایەکدا کۆوە دەبن، یەکێک هاوار دەکا هەرکەس لە لای خوا دۆستێکی هەیە، ڕابێ. کەس هەڵناسێ، مەگین ئەوەی کەسێکی لەبەر خودا بوردبێ"». گوتی: «وازی لێ بێنن، لیێبوردم».

زۆربەی تووڕە بوونی سەرۆکان لەوەیە کەسێک بە توندی دەگەڵیان بدوێ و زمانددرێژیان لەگەڵ کا، ئەمانیش دەیانەوێ خێرا بیکوژن.

لەم کاتەدا ئەو پەیڤەی عیسا کە بە یەحیای گوت بێنەوە یاد کە گوتی: «هەرکەس شتێکی ڕاستی پێگوتی شوکرانەبژێر بە. ئەگەر درۆی گوت، زۆرتر شوکرانەبژێر بە، چونکە بەبێ ماندووبوون کاری چاکی لە دەفتەرت نووسیوە»؛ واتە: عیبادەتەکانی ئەو کەسە دەنووسنە نێو دەفتەری تۆ.

لە لای پێغەمبەر باسی کەسێکیان دەکرد، گوتیان: «پیاوێکی زۆر بەشان و باهۆیە». فەرمووی: «بۆ چی؟» گوتیان: «لەگەڵ هەرکەس زۆران بگرێ، پشتی بە عەرزا دەدا و لەگەڵ هەمووان زۆران دەگرێ». پێغەمبەر فەرمووی: «بە هێز و خوست ئەو کەسەیە چاری تووڕەیی خۆی بکا، نەک ئەوەی پشتی خەڵکی بداتە سەر خاکا». دیسان فەرمووی: «سێ شت هەیە، هەرکەس پێی گەیشت باوەڕی تەواوە: کە تووڕە بوو، نیازی کاری پڕوپووچ نەکا؛ کە شاد بوو، ڕاستەقینە لە بیر نەکا؛ کە توانا بوو پتر

لە مافی خۆی داوا نەکا».

عومەر گوتی: «لە هیچ کەس ئارخەیان مەبە تا کاتی تووڕەیی سەیری نەکەی، لە دینی کەس دڵنیا مەبە تا کاتی تەما و چاوچنۆکی تاقی نەکەیتەوە».

ڕۆژێ عەلی کوڕی حوسێن بۆ مزگەفت دەڕۆیشت، کابرایەک جنێوی پێدا. دەست و پێوەندی ویستیان لێی بدەن، گوتی «وازی لێ بێنن». بە کابرای گوت: «ئەو شتەی لە من لێت بەرپیوارە، گەلێک زۆرترە. هیچ نیازێکت هەیە بە من جێبەجێ بکرێ؟» کابرا شەرمەزار بوو. پاشان عەلی کوڕی حوسێن بەرگەکەی داکەندو پێی داو گوتی هەزار درهەمیشی پێ بدەن.

کابرا دەڕۆیشت و بە ورتەورت ئەمەی دەگوت: «شایەتی دەدەم ئەمە منداڵی پێغەمبەری خودایە». دیسان دەڵێن ڕۆژێ بانگی بەندەیەکی کرد، هیچ وەرامی نەدایەوە. جارێکیتر گاسی کرد، دیسان وەرامی نەدایەوە. گوتی: «بۆچی وەڵامم نادەیتەوە، نەتبیست گاسم کردی؟» گوتی: «ژنەوتم، بەڵام لە ئاکاری بەرزت ئارخەیان بووم کە هیچ ئازارم نادەی». گوتی: «سوپاس بۆ پەروەرندەم! کۆیلەم لێم ئاسوودەیە». کۆیلەیەکی بوو، ڕۆژێک پای مەڕێکی شکاند. گوتی «بۆ وات کرد؟» گوتی: «بە قەستی وام کرد، تا تۆ تووڕە کەم». گوتی: «کەوابوو، منیش ئەو کەسەی تۆی دنە داوە تووڕە دەکەم». واتە شەیتان و ڕزگاری کرد. یەکێک دژوێنی پێدا، گوتی: «ئەی مێرخاس! لە نێوان من و دۆژەهدا ملەیەک هەیە، گەر لەو ملە بپەڕێمەوە لەم پەیڤەی تۆ ترسم نییە، بەڵام ئەگەر نەپەڕێمەوە لەوەی تۆ گوتت خراپترم».

پەیغەمبەر فەرمووی: «کەس هەیە لەبەر پشوودرێژی و لێبۆردوویی، ئاستی شەو زیندەداران و ڕۆژ بەڕۆژووانی پێ دەدرێ و کەسی وا هەیە ناوی لە ریزی ستەمکاران و زۆرداران دەنووسرێ، بە بێ ئەوەی بێجگە خێزانی هیچ وڵاتێکی هەبێ».

دەگێڕنەوە کە ڕۆژێ ئیبلیس هاتە لای مووسا و گوتی: «سێ شتت پێ فێر دەکەم، لە لای خوداوە تکام بۆ بکە». مووسا گوتی: «ئەو سێ شتە چین؟» گوتی: «لە توندی خۆت بپارێزە، هەرکەس توند و سەرسووک بێ، من وای یاری پێ دەکەم کە منداڵان دەگەڵ گۆ؛ خۆت لە ژنان بپارێزە، چونکە لە هیچ یەک لەو داوانەی لە بەرانبەر خەڵک ئاوەڵام کرد، بە قەدەر ژنان دڵنیا نیم؛ سێهەم، لە بەخیلی و چاونەزێری دوور بگرە، هەرکەس ڕژد بێ، دین و دونیای پێکڕا دەفەوتێنم».

پەیغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس بەربە تووڕەبوونی بگرێ و خۆی ڕاگرێ، کەچی بتوانێ تووڕە بێ، پەروەردگار دڵی لە هێمنی و بروا تەژی دەکا؛ هەرکەس لە بەر ڕێزی پەروەرندەی بە بەرگی دونیا خۆی نەخەملێنێ، خوای گەورە بەرگی گەورەیی دەبەر دەکا». دیسان پەیغەمبەر فەرمووی: «هاوار لەو کەسەی تووڕە بێ و تووڕەبوونی پەروەردگار لە بیر بباتەوە».

یەکێک بە پێغەمبەری گوت، شتێکم پێ فێرکە کە بمباتە بەهەشت. فەرمووی: «تووڕە مەبە دەڕۆیتە بەهەشت». گوتی: «ئیتر». فەرمووی: «داوای هیچ شت لە کەس مەکە دەڕۆیە بەهەشت». گوتی: «ئیدی». فەرمووی: «پاش نوێژی عەسر، حەفتا جار "استغفرالله" بڵێ تا خوا لە گوناحی حەفتا ساڵت خۆش بێ». گوتی: «من حەفتا ساڵ گوناحم نییە». فەرمووی: «گوناحی دایکت». گوتی: «دایکیشم ئەوەندە گوناحی نییە». فەرمووی: «گوناحی باوکت». گوتی: «بابم ئەوەندەی گوناح نییە». فەرمووی: «گوناحی براکانت».

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەڵێ: پێغەمبەر سامانێکی دابەش دەکرد. زەلامێ گوتی: «ئەم بەش‌کردنە بۆ خودا نییە»؛ واتە بە ئینساف نییە. ئیبنی مەسعوود بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە. پێغەمبەر ئەوەندە تووڕە بوو کە روومەتی سوور هەڵگەڕا؛ بەڵام بێجگە لەمە چیدی نەگوت: «رەحم و بەزەیی پەروەردگار ببارێتە سەر مووسای برام؛ چونکە ئەویان پتر لەمانە ئازار داوەو هیچی نەگوتووە».

بە کورتی ئەمەی بێژرا، بۆ ئامۆژگاری سەرۆکان و خونکاران بەستە؛ چونکە گەر بڕوایان هەبێ لە دڵیاندا کاریگەر دەبێ و گەریش کاریگەر نەبوو، دیارە دڵیان لە باوەڕ بۆش بووە و بێجگە پەیڤێ سەرزارەکی چیدییان بۆ نەماوەتەوە؛ باسی بڕوا -کە لە دڵ بێ- شتێکە و خودی بڕوا شتێکی‌ترە. بەڕاستی نازانم بڕوای ئەو دەست و پێوەندە چۆنە کە ساڵانە چەن هەزار درهەم و دینار بە ناڕەوا کۆوە دەکەن و دەیدەنە کەسێکی‌تر. بۆیە هەمووی لە ئەستۆی ئەوە و لە رۆژی پەسڵاندا هەمووی لەو دەسێننەوە، کەچی قازانجی ئەو کارە بۆ کەسی‌ترە و ئەمەش ئەوپەڕی نەزانی و ناموسوڵمانییە. وەسسەلام.

# کتێبی سێهەم – کوشندەکان (مهلکات)

ئەم بەشە بریتیە لە دە بنەما:

بنەمای یەکەم - راڤەی راهێنانی نەفس

بنەمای دووەم - دەرمانی ئارەزووەکانی زک و ژێر زک

بنەمای سێهەم - دەرمانی زۆربێژی و زیانەکانی زمان

بنەمای چوارەم - دەرمانی نەخۆشی توورەیی، چاوچنۆکی و ئێرەیی

بنەمای پێنجەم - دەرمانی گراوی دونیا

بنەمای شەشەم - دەرمانی خۆشەویستی ماڵ و زیانی چرووکی و رژدی

بنەمای حەوتەم - دەرمانی گراوی پلە و پاگە و شانوشکۆ

بنەمای هەشتەم - دەرمانی چاوە و دووڕوویی لە عیبادەتدا

بنەمای نۆهەم - دەرمانی لووتبەرزی و خۆبەزلزانی

بنەمای دەهەم - دەرمانی فیز و دەمار و بەخۆهەڵخەڵەتان

## بنه مای یه که م - راهێنانی نه فس و پاکژ کردنه وه ی له خووی نزم

لەم بەشەدا ڕاڤەی کردەوەی بەرز دەکەین تا ڕاستییەکەی لێمان ڕوون بێ. پاشان ئاشکرای دەکەین کە گەیشتن بە بەرزی ئاکار، بە ڕاهێنانی نەفسە، بۆیە ڕێگاکەشی ڕوون دەکەینەوە. نیشانەکانی ئاکاری نزم دەخەینەڕوو؛ چۆنییەتی ناسینی کەمایەسییەکانی خۆ ڕوون دەکەینەوە؛ نیشانەی خووی جوان ڕاڤە دەکەین. ڕێگای ڕاهێنانی منداڵان باس دەکەین؛ پاشان کۆشەوەی مرید لە سەرەتای بڕینی ڕیبازی پەروەرندەی شرۆڤە دەکەین.

### ڕاڤەی هێژایی و چاکەی ئاکاری جوان

پەروەردگار موستەفای بە ئاکاری بەرز پەسن کرد و گوتی: وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ[1]. پێغەمبەر فەرمووی: «بۆیە نێردراوم تا بەرزی ئاکارتان پێ شان دەم». دیسان فەرمووی: «قورسترین شت کە دەخرێتە نێو کێشانەوە، خووی جوانە».

یەکێک ڕۆیشتە لای پێغەمبەر و فەرمووی: «دین چییە؟» گوتی: «ئاکاری جوان». لە لای ڕاستەوە هاتەوەو لە لای چەپەوە گەڕایەوە و هەر ئەوەی پرسی و پێغەمبەریش هەر ئەو پەرسڤەی دایەوە و فەرمووی: «دین ئەوەیە کە تووڕە نەبی».

لە پێغەمبەریان پرسی: «هێژاترین کار چییە؟» گوتی: «خووی بەرز و جوان». یەکێک گوتی: «پەندێکم دەرێ». فەرمووی: «لە هەر کوێدا بووی ترسی پەروەرندەت لە دڵدا بێ». گوتی: «ئیدی». فەرمووی: «پاش هەر خراپەیەک بە چاکەیەک ئاسەواری بسڕەوە». پرسی: «دیسان چی؟» فەرمووی: «لەگەڵ خەڵکوخوا ڕووتگەش و گفتت جوان بێ».

دیسان فەرمووی: «پەروەردگار کردەی جوان و ڕووی گەشی کردە خەڵاتی هەرکەس، قەد ئەو کەسە ناکاتە خۆراکی ئاور». بە پێغەمبەریان گوت: «فلان ژن بە ڕۆژ ڕۆژووە و بە شەو شەونخوونی

---

١ ـ قورئان (٦٨/٤) ئاکاریشت فرەبەرزە. (هـ).

دەکێشێ، بەڵام ناوچاوی گرژە و گفتی تفتە و خەڵکی دراوسێ و جیرانان بە زمان دەڕەنجێنێ». فەرمووی: «جێگای دۆژەهە».

پێغەمبەر فەرمووی: «خووی خراپ، وەکوو سرکە چلۆن هەنگوین دەفەوتێنێ، عیبادەتەکان بە خەسار دەدا». لە کاتی دوعا و سکاڵادا دەیگوت: «پەروەرندەم! بە جوانی خولقاندمت، ئاکار و خوو و خدەشم جوان کە». هەروەها: «ئەی پەروەرندەم! لەش ساغی و تەندروستی و ڕووی گەشم پێ ببەخشە».

لە پێغەمبەریان پرسی: «چ شتێ چاترە کە پەروەردگار بیداتە بەندەی؟» فەرمووی: «ئاکاری بەرز». دیسان فەرمووی: «ڕووی گەش و خۆش بۆ سڕینەوەی هەڵە و گوناح، وەکوو هەتاوە بۆ سەهۆڵ».

عەبدولڕەحمانی سەمۆرە دەڵێ: لە لای پێغەمبەر بووین، فەرمووی: «دوێشەو شتێکی سەیرم بینی: پیاوێکم دی لە ئۆممەتی خۆم کە بەرانبەر پەروەردگاردا چۆکی دابوو؛ لە نێوانیاندا پەردەیەک بوو، ئاکاری جوانی هات و ئەو پەردەیە فڕاند و دەگەڵ خودا بوونە یەک». فەرمووی: «مرۆڤ بەڕووی گەش وەکوو کەسێکە بە ڕۆژ ڕۆژوو بێ و بە شەو نەخەوێ و خەریکی نوێژ بێ؛ لە ڕۆژی پەسڵاندا لە شوێنێکی بەرز ڕۆدەنیشێ، هەرچەند عیبادەتیشی زۆر نەبێ».

ئاکاربەرزترین کەس، پێغەمبەرمان بوو؛ ڕۆژێک ژنەکانی لە لای ئەو دەنگیان هەڵبڕیبوو و نەیاندەهێشت قسە بکا؛ عومەر هاتە ناو، هەموو هەڵاتن. عومەر گوتی: «ئەی نەیارانی خۆ! شەرم لە من دەکەن؟ لە پێغەمبەر شەرم ناکەن؟» گوتیان: «تۆ لە پێغەمبەر توند و تووڕەتری». پێغەمبەر فەرمووی: «ئەی کوڕی خەتتاب! بە پەروەردگارێک کە گیانم لە دەستیدایە! ئەگەر شەیتان لە ڕێگایەکدا تووشت بێ، ناوێرێ لە گەڵت ڕووبەڕوو بێ و لە ترسانت، ڕێی دەگۆڕێ».

فوزەیلی عەییاز گوتی: «دۆستی لەگەڵ داوێن پیسێکی ڕووگەشم پێ خۆشترە تا قورئان خوێنێکی ڕووگرژ».

ئیبنولمبارەک لەگەڵ پیاوێکی مۆن و گرژ، هاوسەفەر بوو. کە لێی دابڕا، دایە پرمەی گریان. گوتیان «بۆچی دەگریێ؟» گوتی: «ئەم داماوە لە لای من ڕۆیشت و ڕووی گرژومۆنی لەگەڵی مایەوە و لێی جیا نەبووەوە».

ئەبووبەکری کەتتانی دەڵێ: «سۆفێتی بە ئاکاری بەرزە؛ هەرکەس لە تۆ ئاکاربەرزتر بوو، لە تۆ سۆفیترە».

یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێ: «ڕووی مۆن و گرژ گوناحێکە کە هیچ عیبادەتێ نایشۆرێتەوە و ئاکاری بەرزیش عیبادەتێکە کە هیچ گوناحێ نایسڕێتەوە».

## راستەقینەی ئاکاری بەرز

لە سەر ئەمەی کە ئاکاری بەرز چییە و کامە، قسەی زۆر بێژراوە؛ هەرکەس هەرچی بۆ هاتبێتە ئاراوە گوتوویە و کەس بە تەواوی لە سەری نەئاخاوتووە؛ وەکوو ئەوەی یەکێک دەڵێ: «بریتیە لە رووگەش بوون»؛ یەکێک دەڵێ: «ئازاری خەڵکی چەشتن»؛ یەکێکتر دەڵێ: «کاری خراپە نەکردن» و لەم پەیڤانە. ئەمانەش هەندێ لق و پۆن نەک سەرلەبەر و بنج و بناوانی ئاکاری بەرز. بەڵام ئێمە راستەقینە و سەرلەبەری دەخەینە روو.

ئەوەی بزانە، مرۆڤ لە دوو شت رسکاوە: **یەکەم** لەش و جەستە کە بە چاوی سەردەبینرێ و **دووەم** گیان کە بە چاوی دڵ دەبینرێ. هەریەک لەم دوانە، چاکە و خراپەی تایبەتیان هەیە. یەکیان جوانخاسی پێ دەڵێن یەکیان ئاکار بەرزی. جوانخاس بۆ رواڵەتە و ئاکاری جوان بۆ دەروون. روومەت تەنیا بە چاوی جوان، یاخۆ دەم یان لووتی جوان و رێکوپێک، بەدەو نابێ. دەروونیش تا ئەو چوار هێزەی کە هەیەتی، خوشیک نەبن -واتە زانست و تووڕەیی و شاوەت و دادوەری لە نێویاندا- تەکووز نەبن، هەر یەک لە جێگای خۆیان نەبن، گوێڕایەڵی ئاوەز نەبن، بە جوانشیرین نازانرێن.

بەڵام **هێزی زانست** - مەبەست لە زانست، چوستی و چالاکییە، تاکوو بتوانێ و وا راهاتبێ کە بە سانایی درۆ و راست لێکهەڵاوێری، کرێت و جوان، جوان بناسێ، راست و ناڕاست لێک کاتەوە. کە دڵی مرۆڤ گەیشتە ئەم ئاستە، هۆزانی -کە کلیلی گەیشتن بە بەختەوەرییە- بۆی دێتە ئاراوە. وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا[1].

**هێزی تووڕەیی** - جوانی ئەم هێزە گوێڕایەڵ بوونیە لە ئاستی ئاوەز و شەرعدا. بە ئیزنی ئەوان رابێ و بە ئیزنی وان بنیشێتەوە.

**هێزی شاوەت** - ئەمەش نابێ سەربزێو بێ و لە فەرمانی ئاوەز لابدا؛ بەو جۆرەی کە بە سانایی چاودێری بکرێ.

**هێزی دادوەری** - ئەمەش دەبێ تووڕەیی و شاوەت لە ژێر رکێفی خۆیدا بگرێ و بە گوێرەی ئاوەز و شەرع بیانبزوێنێ.

تووڕەیی وەکوو تانجییە و شاوەت وەکوو ئەسپ و ئاوەز وەکی سوار؛ ئەسپ برێ جار سەرکەش و سەربزێوە و هەندێ جار، گوێڕایەڵ. تانجیش هەروایە، ناوەبەناوە بە دڵی خۆی دەگەفێ و گوێ بە خێوی خۆی نادا و هەندێ جاریش گوێڕایەڵە؛ کەواتە تا ئەسپ تەواو رانەهاتبێ و تانجیش تەواو

---

١ - (قورئان، ٢٦٩/٢) هەر کەسێ لە هۆزانی بەشێ بدرێ، ئەوە خێری زۆری پێ دراوە.

کەوی نەکرابێ، سوار قەد ڕاوی چاکی پێ ناکرێ و نێچیریشی دەست ناکەوێ؛ تەنانەت ڕەنگە خۆیشی بەفەوتان بدەن.

دادوەری ئەوەیە هەردووی ئەمانە لە ژێر ڕکێفی ئاوەز و شەرعدا بن: بڕێ جار شاوەت بەسەر تووڕەییدا زاڵ کا، تا لووتیبەرزی بشکێنێ، هەندێ جاریش تووڕەیی بەسەر شاوەتدا داسەپێنێ تا زیانەخۆرۆیی کەم کاتەوە.

کە ئەم چوارە بەم چەشنە بوون، ئەمە ئاکاربەرزی تەواوە. ئەگەر هەندێکی بەدەو بێ و هەندێکی نە، ئەوە ئاکار بەرزی تەواو نییە؛ وەکوو کەسێکە کە چاوی جوان بێ و لووتی زل بێ، یاخۆ دەمی جوان بێ و چاوی چەوت بێ.

هەریەک لەمانەی هاتنەگوتن، کرێت بوو، کردەی دزێوی لێ دەوەشێتەوە. دزێوی هەر یەکەش لە دوو ڕووە: یەک لە زۆری و لە ڕادەبەدەرییە، یەکیش لە کەمی و کورتییە.

زانست (چوست و چالاکی) کە زۆر بوو، لە تخووبی خۆی تێپەڕا و کاری خراپی لێ وەشایەوە، خاپێنەری و زۆرزانی لێ دەبێتەوە؛ کە کەموکورت بوو، گەوجی و ساویلکەیی لێ دەوەشێتەوە؛ کە ناونجی بوو، دەبێتە هۆی ڕای ڕاست و بیری تیژ و لێهاتوویی و شارەزایی.

تووڕەیی کە لە ڕادەی خۆی تێپەڕا، دەبێتە ڕووداماڵراوی، کە زۆر کەم بوو، دەبێتە ترسەنۆکی و نەوێری و بێخیرەتی. بەڵام کە ناونجی بوو -نە زۆر بوو نە کەم- دەبێتە مێرخاسی و بوێری و چاونەترسی. مێرخاسی، دەبێتە هۆی هاتنەدی بوێری، ورەبەرزی، پشوودرێژی و نەرم و نیانی و کاوەخۆیی و پشوودرێژی و لەسەرخۆیی. بێ پەروایی دەبێتە هۆی دەمارزلی و لووتبەرزی و خۆبەزلزانی و ڕووداماڵراوی. کە کەموکورت بوو، خۆبەکەمزانی و سەرشۆڕی و داماوی و مەرایی و پەستی و سستی و زمانلووسی دێنێتە دی.

خوستی شاوەت کە لە ڕادەی خۆی تێپەڕا، چاوچنۆکی پێ دەبێژرێ و دەبێتە هۆی داوێنتەڕی و چاونەزێری و نامرۆڤی و ناپاکی و سەرشۆڕی لە هەمبەر دەسەڵاتداران و سووک و خوارگرتنی هەژاران. ئەگەر کەم و ناتەواو بوو، دەبێتە هۆی سستی و ناپیاوی و خۆ بە هیچ زانی. کە ناونجی بوو، پاک داوێنی پێ دەبێژرێ و شەرم و چاوتێری و بەکاوەخۆیی و ئاسانگری و ژیری و هۆزانی لێ دێتە دی.

هەر یەک لەمانە، دوو سەری کرێت و دزیوی هەیەو ناوەندێکی بەدەو و جوان و پەسەندکراو. ئەو ناوەندەی لە نێوانی ئەم دوو ڕەهەندەدایە، لە موو باریکترە؛ ڕێگای ڕاستیش هەر ئەوەیە؛ لە باریکیدا وەکوو سیراتی دواڕۆژە؛ هەرکەس لەم ڕاستەڕێیەدا ڕێگای بڕی، لە ڕاستەڕێی دواڕۆژدا بە بێوەی دەپەڕێتەوە.

بۆیە پەروەردگار لە هەموو کارێکدا فەرمووی کە میانەڕەو بن: وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا[1]. پەسنی ئەو کەسەی کرد کە لە نەفەقەدا نەدەس قووچاوەو نە دەست بلاو و نێوان رادەگرێ. بە پێغەمبەری گوت: وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ[2]؛ واتە: دەستەکانت مەبەستەوە کە هیچ بە هیچ کەسێ نەدەی، پانیشی مەکەرەوە کە هەرچیت هەیە بیبەخشی و بۆ خۆت بە نسک و ناهمێ بمێنییەوە.

کەواتە ئاکار بەرز ئەو کەسەیە کە لە هەموو ئەم واتایانەدا نێوان رابگرێ؛ هەر وەکوو جوان چاک بەو کەسەی دەڵێن کە هەموو ئەندامەکانی جوان و رێک‌وپێک بن. لەم بوارەدا خەڵکی چوارتاقمن:

**یەکەم** ئەوە کەسەی کە هەموو ئەم دانستانەی بە تەواوی بێ پێی دەڵێن ئاکار بەرز. هەموو خەڵکی دەبێ چاوی لێ ببرن و ببنە پێڕەوی. کەس لەم ئاستەدا نییە، بێجگە مستەفا، هەر وەکوو کەس لە جوان چاکیدا وەکوو یووسف تەواو نەبوو.

**دووەم** ئەو کەسەی کە هەموو دانستەیەکی کرێتی تێدا کۆوەکرابێ و پێێ دەڵێن بێئاکار. خەڵکی دەبێ لیێ دوور بگرن و لە نێو خۆیان وەدەری نێن، چونکە لە کرێتیدا شان لە شانی شەیتان دەدا و شەیتانیش لەوپەڕی دزێویدایە؛ هۆی دزێوی شەیتان، کرێتی دەروون و دانستە و ئاکاریە.

**سێهەم** ئەو کەسەی کە لە نێوان ئەم دوو کەسەدایە و لە چاکە نزیکترە.

**چوارەم**، ئەو کەسەیە کە لە نێوان ئەم دووانەیە و کەچی پاڵ دەداتە لای خراپەوە.

هەروەکوو چۆن لە دیمەن و رواڵەتدا، جوانی لە رادەبەدەر و دزێوی چاوکوێرکەر زۆر دەگمەنە و پتری خەڵکی ناونجین، چاکی ئاکاریش هەروایە. کەواتە، هەموو دەبێ تێبکۆشن تا ئەگەریش ناگەنە ئەو پەڕی ئاکار بەرزی، لانی کەم پاڵ بدەنە لایەوە؛ ئەگەر هەموو هەڵس و کەوتیان بەدەو نییە، زۆرتریان بەرەو خاسە برۆن. هەروەها چۆن جیاوازی نێوان روومەتی جوان و ناشرین رادەی نییە، بۆ ئاکاریش هەر ئاوەهایە.

ئەمەی بێژرا واتای ئاکاری جوان بوو؛ ئەمەش نە یەکە و نە دە و نە سەد، بەڵکوو لە ژماردن نایە؛ بەڵام بنەمای ئەمە، هێز و خوستی زانست و تووڕەیی و شاوەت و دادە و ئەوانیتر لق و پۆین.

---

[1] ـ (قورئان، ٢٥/٦٧) ئەوانەش کە لە کاتی ماڵ بەخشینا، نە یەکجاری دەس بڵاون، نە تەواویش دەست قووچاون؛ هەر لەو ناوەنـدەدا ماون. (هـ).

[2] ـ قورئان، ١٧/٢٩.

## ڕاڤەی ئەمەی کەدەلوێ ئاکاری بەرز بەدەست بێنین

هەندێ گوتوویانە: چون دیمەن و ڕواڵەت هیچ ناگۆڕدرێ و لەوەی کە خودا ئافراندوویە بەرەو خاسی و خراپی ناڕوا -واتە باڵای کورت، بەرز نابێ، باڵای بەرز کورت نابێ، جوان کرێت نابێ و کرێت جوان نابێ- ئاکاریش کە ڕوومەتی دەروونە، ناگۆڕدرێ. بەڕاشکاری دیارە ئەم پەیڤە هەڵەیە؛ ئەگەر وابایە، ڕاهێنان و ئامۆژگاری و پەند و کۆشەوە بۆ ئاکاری بەرز، بێواتا بوو و پێغەمبەر نەیدەفەرموو: «حَسِّنُوا اَخلاقَكُم»؛ ئاکارتان جوان کەن. ئەمە چۆن نالوێ، لە کاتێکدا چوار پێی شەمووز ڕادەهێنرێ و نێچیری کێوی کەوی دەکرێ.

ئەم بەراوردە هەڵەیە، چونکوو ئەم چەمکانە دوو بەشن:

هەندێ شت هەیە مرۆڤ ڕێی تێنابا؛ وەکوو لە ناوکەی خورما، سێو نایەتە بەر؛ کەچی بە ڕاهێنان و چاودێری داری خورمای لێ دێتە دەر. هەروەها تووڕەیی و شاوەت بە تەواوی ناکرێ بە ویستی مرۆڤ لە دەروونی وەدەر بنرێ؛ کەچی بە چاودێری و کۆشەوە ڕادەهێنرێ و نێوان ڕادەگرێ. ئەمە بە ئەزموون سەلمێندراوە، کەچی بۆ هەندێ زۆرتر دژوارە.

هۆی دژوارییەکەی دوو شتە: **یەکەم** ئەوەیە کە لە فیترەتدا بە هێزتر ئافرێندراوە؛ **دووهەم** ماوەیەکی چاک پەرای کردووە تا تەواو بەهێز بووە.

### خەڵکی لەمەدا چوار جۆرن:

**جۆری یەکەم** - ئەو کەسەیە کە دڵی پاراو بێ، هێشتا چاک و خراپ لێک ناکاتەوە، خووی نە بە چاک و نە بە خراپ نەگرتووە، بەڵام لەسەر فیترەتی یەکەمە و دەکرێ ڕابهێنرێ و ڕوو لە چاکە بنێ. ئەمە پێویستی بە کەسێکە کە ڕایبێنێ و زیانی خراپەی پێ بنوێنێ و لە ڕاستەڕێ شارەزای کا. منداڵانی تازە بە دونیا هاتوو هەروان، بەڵام دایکوباب لێیان تێک دەدەن، دونیایان لەبەر چاو جوان دەکەن. بە حاڵی خۆیان وێڵیان دەکەن و لە ڕاستەڕێ شارەزایان ناکەن. خوێنی دینی ئەم کەسانە لە گەردنی دایک و بابیانە، بۆیە پەروەردگاریش فەمووی: «قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارًا...[1]».

**جۆری دووەم** - ئەو کەسەیە کە هێشتا خێی نەداوەتە کاری نالەبار، بەڵام ماوەیەک کەوتۆتە دووی شاوەت و غەزەب. چادەزانێ کە نابێ لەم ڕێگایەدا بڕوا. کاری ئەم کەسە دژوارترە، چونکە پێویستی بە دوو شتە:

**یەکەم**، خووی خراپ لە خۆی دوورکا؛

---

١ ـ قورئان (٦/٦٦) خۆتان و کەس و کاریشتان لەو ئاگرە بپارێزن. (هـ).

**دووەم،** تووی چاکە بچێنێتە دەروونی. ئەگەر نیازێکی بۆ هاتە گۆڕێ، دەبێ خێرا لە خراپەی پاکژکا.

**جۆری سێهەم،** ئەو کەسەیە کە خێێ دابێتە خراپە و کاری نالەبار، کەچی بۆ خۆی بە چاکی بزانێ و لە کردەی خۆی پاشگەز نەبێ. ئەم کەسە مەگین بەدەگمەن، ئەگینا چاک نابێ و ناگەڕێتەوە.

**جۆری چوارەم،** ئەو کەسەیە کە شانازی بە کاری خراپ و نالەباری دەکا و پێی وایە کارێکی مەزن و پڕبایەخی کردووە؛ وەکوو کەسێک شات و شووت دەکا و دەڵێ ئەوەندە کەسم کوشتووە و ئەوەندە خواردنەوەم خواردۆتەوە. ئەم یەکە قەد چاری نایە، مەگین خوا بۆ خۆی چارەسەری کاو بیهێنێتەوە سەر هێڵی راست.

## راڤەی رێی دەرمان

بۆ سڕینەوە و لابردنی ئاکاری خراپ، تەنیا یەک رێگا چارە هەیە؛ ئەو رێگایەش ئەوەیە کە هەرچی ئەو ئاکارە نزمە پێی بڵێ، ئەم بە ئاوەژووی ببزوێتەوە؛ چونکە شاوەت تەنیا بە دژایەتی دەشکێتەوە و لە راستیدا هەموو شتێک بە دژەکەی دەشکێتەوە. هەر وەکوو دەرمانی هەر شتێک کە لە سۆنگەی گەرمیوە بێ، خواردنی ساردییە؛ دەرمانی تووڕەیی، پشوودرێژی و لەسەرخۆییە؛ دەرمانی دەمارزلی خۆخوارگرییە؛ دەرمانی رژدی، دەهندەیی و بەخشندەییە.

کەواتە، هەرکەس خووی بە چاکە گرت، ئاکاری بەرزی لە دڵدا دێتە دی. رازی ئەمەی کە شەریعەت بۆ کاری چاکە فەرمانی داوە، ئەمەیە کە روومەتی دزێوی دڵ بکاتە روومەتی جوان و بەدەو. هەرچی مرۆڤ بە کۆشەوە خووی پێ بگرێ، دەبێتە پاژێ لە سروشتی؛ منداڵ سەرەتا زۆری رق لە قوتابخانە و خوێندن هەیە و بەردەوام دەیەوێ لە خوێندن هەڵبێ، بەڵام کە گەورە دەبێ و لەسەر خوێندنی رادەگرن، زۆری چێژ لێ دەبا و دەبێتە کەرتێ لە سروشتی و خووی پێ دەگرێ و لە هیچ شتەک وەکوو خوێندن چێژ نابا. بۆ خۆی ناتوانێ لە سەری پشوودرێژ و بەکاوەخۆ بێ؛ بەڵام ئەوەی بە ئاوەژووی حەز و تاسە بێ، بە پشوودرێژی و بەردەوامی و پێداگری خووی پێ دەگیرێ و دەبێتە سروشتی، بە چەشنێ کە پێی خۆشە هەموو خۆشی و چێژی دونیا بدات و ئەو خۆشیەی لێ دوور نەبێ.

تەنانەت تاقمێ جەردە شانازی دەکەن بەوەی کە دەستیان ببڕن یا خۆ لێیان بدەن؛ هەروەها پیاوانی ئۆبنە و حیزیش -هەر چەندە کارەکەیان گەلێک کرێتە- شانازی بە خۆ دەکەن و بە خۆیاندا هەڵدەڵێن؛ هەروەها بیرکەن و قومەشکێنانیش وەکوو زانایان و پادشایان شانازی بە خۆ دەکەن؛ ئەمانەش هەمووی ئەنجامی خووگرتن و هۆگر بوونە. هەروەها ئەو کەسەی کە خوو دەگرێتە

خواردنی خاک، وای لێ دێ کە ناتوانێ بەر بە خۆی بگرێ و خۆی تووشی نەخۆشی و خەسار و زیان دەکا.

کەوابوو، ئەوەی کە دژ بە سروشتی مرۆڤە و بە خوو پێگرتن وەکوو تەبع و سروشتی مرۆی لێ دێ، ئاشکرایە ئەوەی کە دەگەڵ سروشتی مرۆڤ گونجاو و سازگارە و بۆ دڵ وەکوو خواردن و خواردنەوەیە بۆ لەش، باشتر بە عیبادەت و بەجێهێنانی بەندەگی و ناسینی بینایی چاوان، خووی پێ دەگرێ. هێنانە ژێر رکێفی شاوەت و توورەیی، نیازی سروشتی مرۆڤە؛ چونکە مرۆ لە گەوهەری فریشتەکانە و ئەوەش خواردنی وییە. ئەو کەسەی کە حەزی بە ئاوەژووی ئەمەیە، نەخۆش کەوتووە، بۆیە خواردنی خۆی لێ بۆتە قورقوشم. ئەوەش دیارە کە نەخۆش رقی لە خواردنی پاک و چاکە و پاپای خواردنی زیان هێنەری لە دڵ دەبزوێتەوە.

کەوایە، هەرکەس پتر لە ناسین و بەندەگی خودا، هۆگری شتەکیتر بێ، نەخۆش و دەردەدارە؛ خوداش فەرمووی: «فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ [1]». دیسان فەرمووی: إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ [2] سَلِيمٍ. هەروەکوو چۆن لەشی ناساغ لە مەترسی مردنی ئەم جیهانەدایە، دڵی دەغەزیش لە مەترسی مردنی ئەو جیهانایە. وەکوو چۆن نەخۆش چاک نابێتەوە تا ئەوەی پارێز نەکاو ئەو دەرمانەی بە ئاوەژووی ویستی خۆیە نەیخواتەوەو ئاوڕ لە چیدی نەداتەوە و لە پەیڤی پزیشک لانەدا، نەخۆشی دڵیش هیچ دەرمانی نییە مەگین دژایەتی لەگەڵ پاپای نەفس و بە گوێکردنی خودانی شەرع کە پزیشکی دڵی خەڵکە.

بەگشتی پزیشکی لەش و پزیشکی دڵ یەک رێیان هەیە: گەرمی بکەنە ساردی و ساردی بکەنە گەرمی. ئەوەی خۆبەزلزانی تووشی هاتبێ، بە خۆخوارگرتن، چارەسەری دێ؛ ئەگەر لەرادە بەدەر خۆی بەخوار بزانێ، بە نەختێ لووت بەرزی دەرمانی دەکرێ.

**ئاکار بە رزبوون سێ هۆی هە یە :**

**یەکەم** ئەوەی کە لە فیترەتیدایە؛ ئەوەش دەهندەیی و بەزەیی بینایی چاوان دەگەینێ کە کەسێکی لە رۆژی ئەزەڵەوە بە ئاکاربەرز خەملاندبێ؛ وەکوو دەهندەیی و دلاوایی و دلۆڤانی. لەم چەشنە زۆرن.

**دووەم** ئەو کەسانەی کە بە کۆشەوە و تەقالا کردە و ئاکاریان جوان کەن و خووی پێ بگرن.

---

١ ـ (قورئان، ٢/١٠) دڵیان دەغەزێکی هەیە. (هـ).

٢ ـ (قورئان، ٢٦/٨٩) مەگین ئەوەی وەل دڵی پاک، بچێتە بارەگای خودا. (هـ).

**سێهەم** ئەوەی، کەسانێکی ئاکار بەرزی خوو و خدە جوان ببینێ و توخنیان کەوێ و لە گەڵیان بێ و بەبێ ئەوەی خۆی بزانێ، خوویان بگرێ و ئاکاری وەک ئەوانی لێ بێ.

ئەوەی هەرسێی ئەمانەی بۆ دەست بدا -واتە لە فیترەتدا ئاکار بەرز بێ، لەگەڵ چاکان دابنیشێ و هەڵس و کەوتی ڕێک و جوان بێ- دەگاتە بەرزترین ئاستی ئاکاربەرزی. ئەوەش لە هەر سێکی ئەمانە بێوەر بێ، لە ناخی چارەڕەشی و نگمەساری ڕۆدەچێ.

لەم مەودایەدا قوناغی زۆر هەیە؛ ڕادەی بەختەوەری و چارەڕەشی هەرکەس بە گوێرەی ئەو قوناغانە دیاری دەکرێ. فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ[1].

**سەرنج:** سەرەتای هەمووی بەختەوەرییەک کۆشەوەیە بۆ کاری چاک

هەرچەند چاکە بە ئەندامان دەکرێ، بەڵام مەبەست پاراوکردنی دڵ و دەروونە؛ چونکە دڵە کە بۆ ئەو جیهانە سەفەر دەکا، بۆیە دەبێ چاک و پاک و بەرز بێ تا چاوی بە دیتنی بینایی چاوان ڕوون بێتەوە. هەروەها وەکوو ئاوێنەیەکی ساف و بێخەوش بێ تاکوو وێنەی جیهانی مەلەکووتی تێدا دیار بێ. کەوابوو، جیهانێ لە دەروونی خۆیدا بەدی دەکا، کە بەهەشتی لە لا ناچیزە. هەرچەن لە پاشەڕۆژدا لەشیش بەشی لێدەبا، بەڵام مەرج دڵە و لەش پاشکەوتووی دڵە.

دڵ لە ماکێکە و لەش ماکێکیتر. دڵ هی جیهانی مەلەکووتە و لەش هی ئەم کۆنە هەوارە.

هەرچەند دڵ و لەش لێک جیاوازن، بەڵام پێوەندییەکیان لە نێواندایە کە هەرچی لەش چاکە بکا، ڕووناکیەک دەگاتە دڵ و هەر چی خراپەی لێ بوەشێتەوە، ژەنگارێ دڵ دادەگرێ. ئەو ڕووناکیە تووی بەختەوەرییە و ئەو ژەنگارە تووی نگمەساری. لە سۆنگەی ئەم پێوەندییەوە مرۆیان هێناوەتە نێو ئەم دونیاوە، تا لە لەشی ئامرازێ چێ کاو دانستەکانی چاک و پاک و بەرز کاتەوە.

نووسین پیشەیەکی تایبەتی دڵە، بەڵام بە هۆی قامکەکانەوە جێبەجێ دەکرێ. ئەگەر کەسێک پیێ خۆش بوو جوان بنوسێ، دەبێ لە نووسیندا تێبکۆشێ تا جوانتر بنووسێ و ئەو جوان نووسینە لە دڵیدا نەخش ببەستێ. کە نەخشی بەست، قامکەکان ئەو وێنەی لە دڵدایە وەریدەگرن و لەسەر کاغەزی دەنووسن.

کردەوەی جوانیش هەروایە، دەبێتە هۆی ئاکاری جوان، کە ئاکار و خووی دەروون جوان بوو، کردەوەو هەڵسوکەوتیش بەرز و جوان دەبن.

کەوابوو، سەرەتای هەموو بەختەوەرییەک کۆشەوە بۆ کاری چاکە؛ بەرهەمەکەی ئەوەیە کە

---

[1] ـ قورئان (٨/٧/٩٩) سا هەرکەسا بە سەنگایی مێرووڵەی هەرە وردیلە چاکەی هەبووبا، هەرکەسیش بە قورسایی مێرووڵەی هەرە وردیلە خراپەی بووبا، دەیبینا. (هـ).

دەروون بەخووی چاک دەخەملێتەوە، ئەوسا ڕووناکی ئەو جوانییە ئاشکرا دەبێ و کردە و هەڵس‌وکەوتی جوانی دوابەدوا لێ‌دەوەشێتەوە. ڕازی ئەمەش، پێوەندی نێوان دڵ و لەشە؛ ئەم بەسەر ئەودا کاریگەر دەبێ و ئەو بەسەر ئەمدا. لەم سۆنگەیە هەر کارێک کە بە هەڵە ڕووبدا، پووچەڵ و بەتاڵە؛ چونکە ئەو کردەوە هیچ لە دڵدا کاریگەر نابێ و دڵ لیێ بێ ئاگایە.

**سەرنج:** هەموو ئاکارە جوانەکان دەبێ ببنە تەبع و سروشت

نەخۆشێک کە کە تەبعی سارد بێ، نابێ زۆر شتی گەرم بخوا؛ چونکە ڕەنگە ئەو گەرمەش ببێتە هۆیەک بۆ تەشەنەی نەخۆشییەکەی؛ بەڵکوو ئەوە پێوەرو پێوانەیەکی هەیە کە دەبێ نێوانی ڕابگیرێ. مەبەست لەمەش ئەوەیە کە نێوانی مەزاج ڕابگیرێ: نە خەریکی خواردنی گەرمی بێ و نەساردی. کە گەیشتە ئەم ئاستە، واتە نێوانی سارد و گەرم ڕاگیرا، چاک دەبێتەوە و پاش ئەوە دەبێ ئاگادار بێ ئەو هاوسەنگییە تێک نەچێ.

هەروەها ئاکاریش دوو ڕەهەندی هەیە: یەکیان چاک و یەکیان خراپ؛ چاترینی ئەو دووانەش ناوەندیانە. بۆ وێنە بە ڕژد دەڵێن لە ماڵی خۆی بەخت کا، تابۆی سانا ببێتەوە؛ بەڵام نە ئەوەندەی ببێتە زێدەڕۆیی، چونکە ئەوەش هەر خراپە. پێوەری ئەمەش شەریعەتە، وەکوو چۆن پێوەری دەرمانی لەش، زانستی پزیشکییە. دەبێ وای لێ بێ کە هەرچی شەرع بڵێ «بیدە»، بیدات و لیێ دڕدۆنگ نەبێ. هەرچیش شەرع بڵێ ڕایگرەو مەیدە، نابێ بیدات، تا نێوان ڕاگرێ. ئەگەر شەرع لیێ داوای کرد و ئەم بە ئاوەژووی ئەوەی لە دڵدا بوو و بە نابەدڵ داخوازی شەرعی بە جێ هێنا، هەنووکە دڵی نەخۆشە، بەڵام چاک و باشە؛ چونکە بە پێچەوانەی ویستی نەفسی دەبزوێتەوە -هەر چەن بە نابەدڵ- و ئەم کۆشەوە و ڕێگای گۆڕانی سروشتی مرۆڤە.

بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «فەرمانی پەروەرندەتان بە گیان و دڵ بەجێ‌بێنن، گەر پێتان نەکرا، بەنابەدڵ بەجیێ بێنن، چونکە پشوودرێژ بوونیش خێری زۆروزەوەندەیە».

ئەوەی بەنابەدڵ لە ماڵ‌وسامانی بدا، دڵاوانییە، چونکە دەهندە و دڵاوا دەبێ دانی ماڵی پێ گران نەبێ؛ ئەوەی بە کۆشەوە ماڵ ڕابگرێ، ڕژد و چرووک نییە، چونک ڕژد ئەو کەسەیە سروشتی حەزی لە کۆوە کردن و ڕاگرتنی ماڵە.

کەواتە دەبێ ئاکار بە پیێ حەز و ویست بێ، نەک کۆشەوە و تەقالا؛ هەروەها بەرزی ئاکار ئەوەیە کە گوی لە فەرمانی شەرع بێ و ئەو گوێڕایەڵ بوونەی پێ گران نەبێ و لە دەروونیدا تووشی کێشە نەبێ؛ هەروەک پەروەردگار فەرمووی: فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا

تَجِدُواْ فِیٓ أَنفُسِهِمۡ [1] حَرَجٗا؛ واتە: بڕوای ئەمانە بەوە تەواوتر دەبێ کە تۆ بە قازی خۆیان بزانن و لە دڵدا هیچ لایان گران نەبێ و پێی دڵتەنگ نەبن.

ئەمە ڕاز و نهێنیەکی تێدایە کە هەرچەندە ئەم کتێبە جێگای ئەو باسە نییە، کەچی ئاماژەیەکی کورتی پێ دەکەین:

بەختەوەری مرۆڤ لەوەدایە کە دانستەی فریشتەکان وەربگرێ، چونکە لە ماکی ئەوانەو لەم جیهانەدا لاپرە [2] کەوتووە و سەرچاوەی ئەو، جیهانی فریشتەکانە و هەر دانستەیەکی نامۆ کە لەم جیهانە لەگەڵ خۆی با، لەوێ دانی پێدانانێن و دەبێتە هۆی دوور کەوتنەوەی. دەبێ کاتێ ڕۆیشتەلایان لەسەر دانستەی ئەوان بێ و لێرەوە هیچ دانستەیەکی نامۆ و نەناس لەگەڵ خۆی نەبا.

هەرکەس تەمای کۆوەکردنی ماڵی لە دڵ بوو، دەپەرژێتە سەر ماڵی دونیا؛ ئەوەش تەماو تامازرۆی خەرج‌کردنی لە دڵ بوو، ئەویش خەریکی ماڵی دونیایە. هەرکەس لووت‌بەرز بێ، پەرژاوەتە سەر خەڵک؛ هەرکەسیش پاپای خۆبەخوارزانی لە دڵ بێ، ئەویش دڵی پەرژاندۆتە سەر خەڵک. بەڵام فریشتەکان نە دەپەرژێنە سەر خەڵک و نە دونیا، بەڵکوو ئەڤینی بینایی چاوان هەموو کونج و قوژبنی دڵی داگرتوون و بێجگە لە خوا هیچ بیری‌تریان لانەماوە.

کەواتە، دەبێ بەندیواری دڵی مرۆڤ بە دونیاوە بپچڕێ و پاک بێتەوە. ئەو ئاکارانەش کە مرۆڤ ناتوانێ لێیان پاکژ بێتەوە و لە دڵی خۆی وەدەریان نێ، دەبێ نێوانیان ڕاگرێ، بە چەشنێ کە وا بنوێنێ لێی پاک بۆتەوە. وەکوو ئاو کە لە گەرمی و ساردی بێوەر نابێ، کەچی کاتێ شیتین بێ، وەکوو ئەوەیە نە گەرم بێ و نە سارد.

کەواتە هۆی پێداگری لەسەر هاوسانی و نێوان ڕاگرتن، ئەوەیە کە هاتە گوتن. دڵ دەبێ لە هەموو شتێ -بێجگە لە خوا- دابڕێ و بپەرژێتە سەر پەروەرندەی. هەر وەک فەرمووی: ٱللَّهُۖ ثُمَّ ذَرۡهُمۡ فِی خَوۡضِهِمۡ [3] یَلۡعَبُونَ. ڕاستە قینەی «**لا اله الا الله**» هەر ئەمەیە. لەم سۆنگەوە مرۆ ناتوانێ لە هەموو غەوارەیەک خۆی پاکژ کا. بۆیە گوتی: وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ [4] كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا.

لێت خویان بوو کە دۆزی هەموو کۆشەوە و عیبادەتەکان گەیشتن بە یەکیەتییە لەگەڵ پەروەردگار، کە هەر ئەو ببینێ و بەس، پشت هەر بە ئەو ببەستێ و بەس، هەر بانگی ئەو بکات و

---

١ ـ قورئان (٤/٦٥).

٢- لاپرە: نەناس.

٣ ـ( قورئان، ٦/٩١) بێژە هەر خودا ناردوویە؛ تۆ ئیتر وازیان لێ بێنە با بە گاڵتە کردنەوە خۆ خەریک کەن. (هـ)

٤ ـ (قورئان، ١٩/٧١) هەموو کەستان ـ نیلا و بیلا ـ هەر دەبێ بچنە جەحەندەم، بڕیارێکە پەروەرندەی تۆ داویەتی و هەر دەبێ جێ‌بەجێ ببێ. (هـ)

بەس، بە کورتی لە دڵیدا بێجگە لە ئەو هیچ پاپایەکی‌تری نەبێ. کە وای لێ‌هات، ئاکاریشی زۆر بەرز دەبێ، تەنانەت لە جیهانی مرۆڤان باز دەدا و دەگاتە ڕاستەقینەی بینایی چاوان.

**سەرنج:** ڕێگەکانی گەیشتن بە ئاکاری جوان

ئەوەی بزانە کە کۆشەوە (ریاضت)، کارێکی زۆر دژوارە و لە ڕاستیدا وەکی گیان کەنشتە؛ بەڵام ئەگەر پزیشک شارەزابێ، دەرمانێکی ساکار دەنوێنێ و ئەم کۆشەوەیەی لەبەر ئاسان دەکا. پزیشک و هۆزان نابێ هەر لە سەرەتاوە باسی ڕاستەقینەی خودا بۆ مورید بڵێ، چونکە ورەی تێگەیشتنی ئەوەی نییە؛ هەر وەکوو ئەوەی بە منداڵێ بڵێن: «بڕۆرە قوتابخانە تا لە پاشەڕۆژدا ببیتە سەرۆک». دیارە منداڵ هیچ لە سەرۆکایەتی ناگا و هیچ چێژێکی لێ نابا. بەڵکوو دەبێ پێی بڵێن: «ئەگەر بڕۆیتە قوتابخانە، چەوگان و گۆت بۆ دەکڕم تا یاری پێ بکەی». منداڵ بە بۆنەی ئەو شتانەوە دەڕوا بۆ قوتابخانە. کە گەورەتر بوو، بە جل‌وبەرگی جوان دنەی دەدا درێژە بە خوێندن بدا. کە گەورەتر بۆ بەڵێنی سەرۆکی و گەورەیی پێ دەدا و دەڵێ: «بەرگی ئاوریشم بۆ ژنانە». کە گەورەتر بوو ئەوسا پێی دەڵێ: «گەورەیی و سەرۆکی دونیا بێ بنەمایە، چونکی بە مردن دەفەوتێ». پاشان بەڵێنی گەیشتن بە تەختی پادشایی هەتاهەتایی پێ دەدا.

موریدیش ڕەنگە لە سەرەتای ڕێگەدا نەتوانێ بە تەواوی کۆشەوە کا. مامۆستای دەبێ ئیزنی بدا تا سەرەتا بە تەمای ئەو شتانەی خەڵکی پێیان جوانە، هان بدا تا تامازرۆیی دوڕاز و ڕیا، ئارەزووی ورگ و کۆوەکردنی ماڵ‌وسامان لە دڵی بشکێنێ؛ کە لەم قۆناغە تێپەڕا، لووت بەرزییەکی بۆ دێتە دی، بۆیە دەبێ دەماری ئەو لووت بەرزییەی بشکێنێ و بڵێ لە بازاڕدا دەرۆزەیی کە؛ کە لەوەش سەرکەوت، بەر بەو کارەی بگرێ و لە سەرکاری بێ نرخ و سووک دایمەزرێنێ، وەکوو پاکژ کردنەوەی ئاو دەست و شتی وا.

هەر بەم چەشنە هەر دانستەیەکی دزێوی تێدا بەدی کرد، یەک بە یەک دەرمانی کاو بە یەکجار هەمووی پێ نەڵێ، چونکە لە توانی بە دەرەو پێی ناکرێ. لەسەر نیازی دوڕاز و دوڕوویی و ناوی چاک، دەتوانێ هەموو ئازارێک بچێژێ؛ چونکە دوڕازی و ڕیا وەکوو ئەژدیهایە و دانستەکانی‌تر وەکوو مار و دووپشکن؛ ئەژدیها هەموویان هەڵدەلووشێ. دوایین دانستەیەک کە چاکان لێی دەرباز دەبن، ئەم دانستەیە.

## لێکدانەوەو ناسینی نەخۆشییەکانی دڵ و کەمایەسییەکانی نەفس

هەروەک ساغی لەش و دەست و پێ و چاو لەوەدایە کە هەریەک لەم ئەندامانە، ئەو ئەرکەی کە

بۆی ئافرێندراوە و بۆ ئەوە رسکاوە، بە تەواوی جێبەجێی کا -وەکوو ئەوەی کە چاو بەجوانی ببینێ و پێ بەخێرایی بڕوا- ساغی دڵیش لەوەدایە کە ئەو شتەی دانستەیە و بۆ وەی ئافرێندراوە، لە لای سانا بێ و ئەوەی لە ڕۆژی ئەزەلدا بەشێ لە سروشتی بووە، لە لای بەدەو بێ.

## نیشانەکانی ساغی دڵ

ساغی دڵ لە دووشتدا ئاشکرا دەبێ:

یەکەم لە سەرسپێردراوی و دووەم فەرمانبەرداری.

**سەرسپێردراوی** و خۆشەویستی ئەوەیە کە هیچ شت و هیچ کەسی پتر لە بینایی چاوان خۆش نەوێ و بزانێ خۆشویستنی پەروەردگار خۆراکی دڵە، وەکوو نان و خوان کە خواردنی لەشە. هەر لەشێک کە شاوەت و پاپای خواردنی نەما یا خۆ کز بوو، نەخۆشە؛ هەر دڵێکیش کە خۆشەویستی پەروەرندەی لێ لاپرە کەوت، یا خۆ لێی دوورکەوت، ئەویش نەخۆشە. بۆیە پەروەردگار فەرمووی: قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ[1]؛ واتە، ئەگەر باب و خورت[2] و مال و کەسبوکار و هۆز و کەس و کارتان پتر لە پەروەرندەتان خۆش دەوێ، چاوەڕوان بن تاکوو فەرمانی خودانوو دەگا، تا ببینن.

بەلام **فەرمانبەرداری** ئەوەیە کە عیبادەت و بەندەگی بینایی چاوانی لەلا ئاسان بێ و پێویست نەبێ خۆ بخاتە ئازار و چێژی زۆر لە عیبادەت ببا؛ هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «وَ جُعِلَتْ قُرَّةُ عَينِي فِي الصَّلوة[3]».

ئەوەی ئەم نیشانەی لە دڵی خۆی بەدی نەکرد، دەبێ بزانێ دڵی نەخۆشە؛ دەبێ خەریکی دەرمانی بێ. ڕەنگە بزانێ وایە و کەچی واش نەبێ؛ چونکە مرۆڤ کەمایەسییەکانی خۆی نابینێ.

## مرۆڤ بە چوار جۆر دەتوانی نوقسانییەکانی خۆی بناسێ:

**یەکەم** ئەوەی کە بڕواتە لای پیرێکی ڕێزان و شارەزا؛ ئەو پیرە سەیری کا و یەک بەیەکی کەم و کوورییەکانی بۆ بلێتەوە؛ بەلام ئاوەها کەسێک لەم ڕۆژگارەدا بەدەگمەن هەلدەکەوێ.

---

١ ـ (قورئان، ٩/٢٤).

٢- خورت: کوڕ.

٣ ـ نوێژ ڕوونیای چاوی منە.

**دووەم** ئەوەی کە برادەرێکی میهرەبان بکاتە چاودێری خۆی؛ برادەرێک کە بە مەرایی ڕێی لێ تێک نەداو بە چاوچنۆکی لێی زیاد نەکا؛ ئەمەش هەر دەگمەنە.

بە داوودی تاییان گوت: «بۆ دەگەڵ خەڵکی تێکەڵ نابی؟» گوتی: «تێکەڵ بوون لەگەڵ خەڵکێک کە کەمایەسییەکانم دەبینن و پێم ناڵێنەوە، چ کەڵکی هەیە؟»

**سێهەم**، گوێ لە پەیڤی دوژمنانی بگرێ؛ چونکە دوژمن تەنیا نوقسانەکانی دەبینێ؛ هەرچەند دوژمن لافی زۆر لێ دەدا، بەڵام پەیڤەکانی لە ڕاستی بێوەر نین.

**چوارەم** ئەوەی کە سەیری خەڵک‌وخوا کا و هەرچی خەڵکی کردیان و ئەم پێی ناحەز بوو، خۆی لێ ببوێرێ و وابیرکاتەوە کە خۆشی هەروایە.

لە عیسایان پرسی: «ئەم داب و نەریتە لە کوێ فێر بووی؟» گوتی: «لە هیچ کەس. هەر کردەوەیەکی خەڵکی لام کرێت بایە، خۆم لێ دەپاراست». هەروەها دەبێ ئەوەش بزانی کە هەرکەس گێلۆکەتر بێ، خۆی بە چاتر و ئاکاربەرزتر دەزانێ؛ ئەوەش ژیرتر بێ لە هەڵس و کەوتی خۆی دڕدۆنگترە. عومەر لە حوزەیفەی پرسیار کرد: «پێغەمبەر دانستەی دوڕاز و دوڕووانی پێ گوتووی، لەو دانستانە لە مندا چ دەبینی؟»

کەواتە، هەرکەس دەبێ کەمایەسییەکانی خۆی ببینێتەوە؛ چونکە تا دەرد نەناسێ، دەرمانی پێ ناکرێ.

دەرمانی هەموو ئەم دەردانەش، دژایەتییە لەگەڵ ئارەزووەکانی نەفس؛ چونکە پەروەردگار فەرمووی: وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ، فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ.[1]

پێغەمبەر، کاتێ یارانی لە خەزا گەڕانەوە، پێی گوتن: «ئەوا لە جیهاد و خەباتی بچووکەوە، گەڕانەوە لای خەباتی گەورە». گوتییان: «خەباتی گەورە چییە؟» فەرمووی: «خەبات لەگەڵ نەفس».

پێغەمبەر فەرمووی: «نەفستان لە ڕەنج و ئازار مەپارێزن، ئارەزووەکانی بۆ پێک مەهێنن، چونکە سبەینێ لە پەسڵاندا دوژمنیتان دەگەڵ دەکا و تووک و نزا و لەحنەتتان بۆ دەنێرێ، بە جۆرێک کە هەموو بەشەکانی لەشتان لەحنەتی یەکتری دەکەن».

حەسەنی بەسری گوتی: «هیچ چارەوایەکی سەرکەش، نابێ وەکوو نەفس هەوساری توند بێ».

سری سەقەتی دەڵێ: «چل ساڵە نەفسم دەیەوێ کولێرە و هەنگوینێ بخۆم و نەمخواردووە».

---

١ ـ (قورئان، ٧٩/٤٠ و ٤١) بەڵام کەسێ لە گەورەیی پەروەرندەی خۆی ترساوە و لە ئارەزووی دڵی خۆی وازی هێناوە، دیارە بەهەشت ئەنوای ئەوە. (هـ).

ئیبراهیمی خەوواس دەڵێ: لە کێوی «لکام»ی لوبنان هەڵزنام. هەنارێکی زۆرم بینی. ئارەزووی خواردنی هەنارم کەوتەدڵ، یەکێکیانم کردەوە: ترش بوو، نەمخوارد و ڕۆییم. لە ڕێدا پیاوێکم تووش هات، زەردەواڵەی زۆر پێوەی دابوو، هەلاهەلا کەوتبوو. گوتی: «سلاوت لێ بێ ئیبراهیم». گوتم: «چۆنم دەناسی؟» گوتی: «ئەوەی پەروەرندەی بناسێ، هیچی لێ بەرپیوار نابێ». گوتم: «دیارە لەگەڵ پەروەردگارا پێوەندی زۆرت هەیە، بۆچ لیێ ناخوازی ئەم زەردەواڵانەت لە کۆڵ کاتەوە». گوتی: «تۆش پێوەندیت هەیە؛ بۆچ لیێ ناخوازی ئارەزووی هەنارت لە دڵ بڕەوێنێ. چونکە برینی شاوەت هی ئەو جیهانە و زامی زەردەواڵە هی ئەم دونیایە».

ئەوەش بزانە کە هەرچەندە هەنار حەلاڵە، بەڵام ئەوانەی چاودێری هەڵسوکەوتی خۆیانن، دەزانن کە ئارەزووی حەلاڵ و حەرام چوون یەکە. ئەگەر دەرگای حەلالی لێ دانەخەی و لەسەر هێڵی نیاز و پێویست ڕاینەگری، داوای حەرامیشت لێ دەکا. لەم سۆنگەوە ڕێگەی ئارەزووی حەلالیان تەنگ کرد، تا تووشیاری شاوەت نەبن. هەروەک عومەر گوتی: «حەفتا دەرگای حەلالمان لە خۆ داخست، تا تووشیاری حەرام نەبین».

هۆیەکیتری ئەوەیە کە نەفس خووی بە ناز و نیعمەتەوە کرد، حەلالی دونیای خۆش دەوێ، هۆگری دەبێ، دونیای لێ دەبێتە بەهەشت و مردنی بۆ دژوار دەبێ، مەستی و پەستی لە دڵیدا سەر هەڵدەدا؛ کاتێ زیکر و یادی خودا دەکا، زۆری چێژ لێ نابا. بەڵام کە شاوەتی حەلالت لێی قەدەغە کرد، پەشێو و خەمبار دەبێ و دونیای لە لا دزێو دەبێ و پاپای دوارۆژی بەهێز دەبێ. لە کاتی خەم و پەژارەدا، زیکر و یادێکی پەروەردگار، پتر لە سەد زیکری ئاسایی کاریگەر دەبێ.

نەفس وەکوو بازە. کاتێ باز ڕادێنن، لە ژوورێکدا دایدەنێن، هەر دو چاوی دەبەستن، تا لەگەڵ هەموو شتێ نامۆ کەوێ؛ ئینجا کەم‌بەکەم و ناوەبەناوە گۆشتی پێ دەدەن تا هۆگری خێوەکەی بێ و جوان گوێ بۆ پەیڤی ڕادێرێ.

باسی نەفسیش ئاوەهایە؛ هۆگری پەروەرندەی نابێ تا لە هەموو خوویەکی پێشووی نەیبڕنەوە و ڕێگای دیتن و بیستنی نەبەستنەوە و لە کونجێکدا بە برسییەتی و بە بێدەنگی و بێ خەوی ڕاینەگرن. سەرەتا ئەم کارەی زۆر پێ ئەستەمە، وەکی منداڵێک لە شیر بیگرنەوە؛ کەچی پاش ئەوە وای لێ دێ بە زۆریش پێ ناخورێتەوە.

کۆشەوەی هەرکەس ئەوەیە هەرچی لە لای هێژاتر بێ و پترو پێی کەیف خۆش بێ، لیێ دابڕێ و ئەوەی زۆرتر بەندیوارییە، بە ئاوەژووی بجووڵێتەوە: ئەگەر هۆگری پلە و پاگەو ناو و دەنگە، پشتی لێ بکا، ئەگەر شەیدای ماڵ و دراوە، لیێ خەرج بکا. هەروەها ئەگەر بێجگە لە پەروەرندەی خەمڕەوێنی هەیە، لە خۆی بیتارێنێ و ببێتە یاری ئەو یارەی هەتاهەتایی و بێ‌بڕانەوەیە؛ هەرچی بە مردن لیێ

جیا دەبێتەو، بە ویستی خۆی لێی دابڕێ.

دۆستی هەتایی، پەروەرندەی دلۆڤانە، هەروەک بە داوودی فەرموو: «ئەی داوود! یاری بێ دابڕانی تۆ منم، لەگەڵم بە». پێغەمبەر فەرمووی: جوبرەئیل لە دڵمدا گوتی: «أَحبِ مَن اَحبَبْتَ فَأنَّکَ مُفارِقُهُ»؛ لە دونیا هەر کەست دەوێ، خۆشت بوێ؛ چونکە لێتی دەسێننەوە.

**لێکدانەوەی نیشانەکانی ئاکاری جوان**

نیشانەی ئاکاری جوان ئەوەیە کە پەروەردگار لە قورئاندا باسی دەکا، لە سەرەتای سوورەی موئمنوون تاکۆتایی ئایەتی دە؛ هەروەها لەم ئایەتەدا کە دەڵێ ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ[1] و ئەم ئایەتانەی کە دەڵێ: وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا[2] تا کۆتایی.

هەرچیش لە ناساندنی دوڕازاندا بێژراوە، نیشانەی ئاکاری خراپە. هەر وەک پێغەمبەر فەرمووی: «کۆشەوەی بڕواداران بۆ نوێژ و ڕۆژوو و بەندەگییە و تەقالای دووڕووان بۆ خواردن و خواردنەوەیە، وەک ئاژەڵان». حاتەمی ئەسەم گوتی: «بڕوادار خەریکی بیر و ویر و پەندگرتنەو دوڕوو خەریکی چاوبرسێتی و کۆکردنەوەی ماڵوسامانە. بڕوادار لە هەموو کەس ئارخەیانە، بێجگە لە خوا؛ دوڕوو لە هەموو کەس دەترسێ، بێجگە لە خوا؛ بڕوادار بە هیچ کەسێ بێجگە لە خوا هیوای نییە و دوڕاز بێجگە لە خوا بە هەموو کەس هیوای هەیە؛ بڕوادار ماڵی بۆ دین بەخت دەکا، دوڕاز دین و بڕوای فیدای ماڵوسامانی دەکا؛ بڕوادار عیبادەت دەکا و دەگریێ، دوڕاز گوناح دەکا و پێدەکەنێ؛ بڕوادار حەزی لە تەنیایی و دوورەپەرێزییە، دوڕاز مەیلی بەلای قەرەباڵغی و تێکەڵ بوون لەگەڵ خەڵکە؛ بڕوادار توو دەچێنێتە خاک و دەترسێ کە هیچ نەدروێنێ، دوڕاز هیچ ناچێنێ و چاوەنۆڕی درووننەوەیە».

گوتوویانە: «ئاکارچاک ئەوەیە کە شەرمن و کەمبێژ و نەرمنج[3] و ڕاسبێژ و چاکەویس و

---

١ ـ قورعان (١١٢/٩) تۆبەکاران، خواپەرستن، هەر پەسندی خودا دەدەمن، ڕۆژووگرتن، بە کڕنۆش و سوژدە بەرن، هانای کاری چاک دەدەمن و بەرلە نارەوا دەگرن و سنووری خوا دەپارێزن. مژدە بدە بەوانەی خاوەن باوەڕن. (هـ)

٢ ـ قورئان (٦٣/٢٥) عەبدە ڕاستەکانی ڕەحمان ئەو کەسانەن کە بێدەمیە دەچنە ڕێوە و هەر کاتێکیش نەزانەکان بیاندوێنن، پەرسڤی نەرم و نیانیان دەدەنەوە. (هـ)

٣ ـ نەرمنج: ئەوەی زیز نەبێ.

خراپەنەویس و تاعەت زۆر و چاوتێر و خێرخواز بێ بۆ هەموو کەس؛ لەگەڵ هەمووان ئاکار چاک و دلۆڤان و نەرمونیان و پشوودرێژ و دڵناسک و خەمخوار و دۆستی دۆستانە و کەمویس بێ، نەجنێو بدا، نە لەحنەت بنێرێ، نە لە پاشملەی کەس بخوێنێ، نە قسە بێنێ و نە قسە ببا، نە ناوی کەس بە خراپە با، نە بلەز و بە پەلە بێ، نە رق و قینی لە دڵ بێ، نە ئێرەیی بە کەس ببا، رووی گەش بێ و زمانی خۆش بێ و ژبۆ خودا دۆستی و دوژمنایەتی بکات و بەس».

بزانە زۆربەی ئاکاری جوان بە پشوودرێژی و کاوەخۆیی دێتە ئەنجام، هەروەک ئەوەی پێغەمبەریان زۆر رەنجان، دانیان شکان، کەچی گوتی: «پەروەرندەم! لە راستەڕێ شارەزایان کە، چونکە رێ نەزانن».

ئیبراهیمی ئەدهەم لە سارادا بوو، سەربازێک پێێ ڕاگەیشت،، گوتی: «تۆ کۆیلەی؟» گوتی: «ئەرێ». گوتی: «ئاوەدانی لە کوێڕایە؟» گوتی: «لەوێیە» و ئاماژەی بۆ گۆڕستان کرد. گوتی: «من ئاوەدانیت لێ دەپرسم». دیسان هێمای بۆ گۆڕستان کرد. سەربازەکە بەدار لیێ دا و سەری شکاند و پەلکێشی کرد بۆ نێو باژێر. کە یارانی چاویان پێ کەوت، بە سەربازەکەیان گوت: «نەفام! ئەمە ئیبراهیمی ئەدهەم، تاقانەی رۆژگارە». سەربازەکە لە ئەسپ دابەزی و پای رامووسی؛ گوتی: «بۆ گوتت بەندەم؟» ئیبراهیم گوتی: «من بەندەی خودای گەورەم». پرسی: «بۆچی بە جێی ئاوەدانی، بۆ گۆڕستان راموونەت کردم؟» گوتی: «دوایین ژوانگەی هەمووان ئەوێیە، کەواتە هەر ئەوێ ئاوەدانە». سەربازەکە گوتی: «بۆ ئەم بێئەدەبییەم بمبوورە!» گوتی: «کاتێ سەرم شکا، دوعای بەخێرم بۆ کردی». گوتیان: «بۆچی؟» گوتی: «دڵنیا بووم لە سۆنگەی تۆوە خێرم پێ دەگا. نەمویست لە تۆوە بە من چاکە و خێر بگا و لەمنەوە بۆ تۆ شەڕ و خراپە».

یەکێک بانگێشتنی ئەبوو عوسمانی حەیری کرد تا تاقی کاتەوە. کە گەیشتە بەردەرکی ماڵەکەی، نەیهێشت بڕواتە ژوورەوە و گوتی: «هیچ نەماوە». گەڕایەوە. نەختێ دوور کەوتبووەوە، رۆیشت بە دوویا و بانگی کردەوە. ئەویش گەڕایە دواوەو کە گەیشتە بەردەرکی ماڵەکە، هەمان قسەی پێ گوتەوە. چەن جار وای کرد، هەر جار کابرا جواوی دەکرد و ئەبوو عوسمانیش دەگەڕایەوە. لە ئەنجامدا کابرا گوتی: «بە ڕاستی کە زۆر ئاکار بەرزی!» ئەبوو عوسمان گوتی: «ئەوەی لە منت بینی، خووی سەگانە، کە دەریان دەکەی دەڕۆن، کە بانگیان دەکەی دێنەوە؛ ئەمە چ بایەخێکی هەیە؟»

رۆژێ لە بانێکەوە سوێنەیەک خۆڵەمێشیان بە سەریا رژاند. خۆی تەکاند و شوکری خوای کرد. پرسیان: «بۆ شوکرت کرد؟» گوتی: «ئەوەی شیاوی ئاور بێ و بە خۆڵەمێش لێی ببنەوە، دەبێ شوکرانەبژێر بێ».

عەلی کوڕی مووسەڕڕەزا، پێسی رەش بوو. لەبەر دەرکی ماڵەکەیدا لە نەیشاپوور، گەرماوێ بوو، کە

ئەم دەڕۆیشتە ژوورەوە، خاڵییان دەکرد. ڕۆژێ حەمامەکەیان خاڵی کرد و ئەم ڕۆیشتە ژوورەوەو حەمامچییەکە لە بیری نەما. لادێییەک ڕۆیشتە ژوورێ، چاوی پێکەوت، وایزانی هیندیە و لە کرێکارانی گەرماوە. گوتی: «هەستە ئاو بێنە». بۆی هێنا. دیسان گوتی: «هەستە، گڵم بۆ بێنە». ئەویشی هێنا. لادێیی کاری پێدا دەداو ئەمیش بۆی جێبەجێی دەکرد. کە حەمامچییەکە گەڕایەوەو دەنگی کابرای لادێیی بیست کە قسەی دەکرد، ترسا و هەڵات. کە عەلی کوڕی موسای ڕەزا هاتە دەر، گوتیان: «حەمامچی لە ترسی ئەم ڕووداوە هەڵات». گوتی: «بڵێن مەترسە؛ چونکە ئەمە تاوانی ئەو کەسەیە کە تۆمی لە لای کارەکەرێکی ڕەشەوە وەشاند»[1].

عەبدوڵلای دەرزی لە گەورەکانی سەردەمی خۆی بوو. گاورێ هەر ساڵ بەرگێکی لە لا دەدووراند و دراوێکی زەغەلی پێ دەدا و ئەمیش لێی دەسەندو هیچی پێ نەدەگوت. جارێک خۆی نەبوو، شاگردەکەی وەرینەگرت و بە سەریدا دایەوە. کە گەڕایەوە گوتی: «بۆچی وات کرد؟ چەن ساڵە ئەم کابرایە هەروا دەکا و من هیچم پێ نەگوتووەو لێم ئاشکرا نەکردووە و لێم سەندووە تا موسوڵمانێکی-تر نەخاپێنێ و بەو دراوە قەڵبە فێڵی لەگەڵ نەکا، منیش دراوەکەم کردۆتە چاڵ».

وەیسی قەرەنی لە ڕێدا دەڕۆیشت، منداڵان کەوتبوونە دووی و بەردیان بۆ دەهاویشت. گوتی: «بەردی وردم لێ بدەن تا ئەژنۆم نەشکێ، چونکوو ئیدی بە پێوە نوێژم پێ ناکرێ».

کابرایەک جنێوی بە ئەحنەفی قەیس دەدا و پێکەوە دەڕۆیشتن و ئەحنەف بێدەنگ بوو و هیچی نەدەگوت. کە گەیشتنە نزیک هۆزەکەی ئەحنەفەوە، ڕاوەستاو بە کابرای گوت: «ئەگەر جنێوێ ماوە بیدەی، هەر لێرەدا بیلێ؛ چونکە ئەگەر هۆزەکەم بیژنەفن لێت زیز دەبن».

ژنێ بە مالکی دیناری گوت: «ئەی ڕیاکار!» گوتی: «خەڵکی بەسرە ناوی منیان لە بیر چوو بوو، تۆ دیتەوە».

ئەمەی بێژرا نیشانەکانی ئاکاری بەرز بوون، کە دانستەی ئەم تاقمە بوو. ئەمە دانستەی کەسانێکە کە بە کۆشەوە دەروونیان بە تەواوی لە دانستەکانی مرۆڤ پاقژ کردووە و بێجگە بینایی چاوان کەسی دی نابینن و هەرچی دەبینن هەر ئەوە. ئەوەی لە خۆیدا نە ئەم کارانە دەبینێ و نە شتێکی لەمانە کەمتر، نابێ لە خۆبایی بێ و خۆی بە ئاکار بەرز بزانێ.

### شرۆڤەی پەروەردەو ڕاهێنانی منداڵان

باش بزانە کە منداڵ ئەمانەتێکە لە لای دایک و باب؛ ئەو دڵە پاکەی وەکوو گەوهەرێکی هێژایە،

---

[1] - مەبەستی بابی بووە کە زنی ڕەشی هێناوە.

وەکوو مۆم هەموو نەخشێ وەردەگرێ و خۆی بێنەخشە؛ وەکوو زەوینێکی پاکە، کە هەر توویەک بیڕێنی، دەڕوێ: ئەگەر تووی خێر بیڕێنی، دەبێتە هۆی بەختەوەری دین و دونیا و دایک و باوک و مامۆستاکەی لە خێروودمی بەش دەبەن، گەر بە ئاوەژووی ئەمەش بێ، چارەڕەش دەبێ و ئەوانیش تووشی ئەو زیانە دەبن.

خوا دەبێژێ: قُوٓاْ أَنفُسَكُرۡ وَأَهۡلِيكُرۡ نَارٗا[1]؛ خۆتان و مندالانتان لە ئاوری دۆژەەبپارێزن. پاراستنی مندال لە ئاوری دۆژەە، گرنیگترە لە پاراستن لە ئاوری دونیا.

پاراستنی مندال ئەوەیە کە بە جوانی رایبێنێ و ئاکاری جوانی پێ فێرکا و لە دۆستی خراپی بە دوور کا؛ چونکە هەموو خراپەیەک لە دۆستی خراپەوە سەرچاوە دەگرێ. فێری زک لەوەڕاندن و بەرگی جوان و بە نرخ لەبەرکردنی نەکا، چونکە پاش ئەوە ناتوانێ خۆی لێ بپارێزێ و هەموو تەمەنی بۆ ئەو شتانە بە فێرۆ دەڕوا. دەبێ سەرەتا هان بدا ئەو ژنەی کە شیر بە منداڵەکەی دەدا، ئاکارجوان و داوێنپاک و حەلاڵخۆر بێ؛ چونکە ئاکاری کرێت لەو ژنەوە بە هۆی شیرەوە دەگاتە مندال. گۆشت و پێست و خوێنی مندال بە هۆی ئەو شیرەوە گەشە دەکا، لە سروشتیدا لەگەڵ ئەو خراپەیە پێوەندییەک چێ دەبێ کە لە سەردەمی لاوەتیدا خۆی دەنوێنێ.

کە زاری کردەوە، یەکەم شتێک کە دەبێ پێی فێر بکرێ، ناوی «خودا»یە و دەبێ ئەم وشەیە بخرێتە دڵیەوە. ئەگەر لە هەندێ شت شەرمی بوو، ئەمە مزگێنی و بەڵێنیە بۆ ئەوەی کە چرای ئاوەزی پێ کراوە. شەرم دەبێتە پاسەوانێ بۆی کە لە هەرچی دزێو و ناحەزە دووری دەکا.

یەکەم شتێ کە مندال داوای دەکا، خواردنە. دەبێ رێ و رەسمی خواردنی پێ فێر کا. رایبێنێ بە دەستی راستی بخوا و سەرەتا بە ناوی خودا بڵێ و بلەز نەخواو تیکەی ورد بنێ و تەواو بیجاوێ و سەیری پارووی خەلکی نەکا و تا پارووپەک تەواو نەخوا، دەستی بۆ پاروی‌تر نەبا، دەست و بەرگی پیس و پوخڵ نەکا. ناوە بە ناوە نانی خالی پێ بدا تا خوو بە خۆراکەوە نەکا. زۆر خواردنی لا دزێو کاو بلێ: «ئەمە کاری چوار پێ و هیچ نەزانانە». لۆمەی مندالی زۆر خۆر و پەسنی مندالی کەم خۆر کات تا دەماری بجووڵێتەوە و ئەمیش وابکا.

جلکی سپی لەبەر چاوی جوان کاو جلکی رەنگامە و ئاوریشمینی لە پێش چاو دزێو کا و بلێ: «دەبەرکردنی جلکی رەنگامە و ئاوریشمین کاری ئافرەتان و چاوبەلەکانە و خۆ خەملاندن کاری نێرەمۆکانە، نەک پیاوان». ئاگادار بێ کە منداڵەکەی تێکەلاوی ئەو مندالانە نەبێ کە جلکی ئاوریشم و رەنگامە لەبەر دەکەن و بە کەیفی خۆیان رایدەبوێرن؛ چونکە ئارەزووی ئەو ژیانەی دەجووڵێتەوەو ئەو ژیانەش هۆی فەوتانی دین و دنیایە.

---

١ ـ قورئان (٦٦/٦).

لە هەڤاڵی خراپی بپارێزێ؛ چونکە ئەوەی منداڵی لە دۆستی خراپ نەپارێزێ، منداڵەکەی بێشەرم و درۆزن و دەمهەراش و ڕادێ و ئەمانەش بە درێژایی ڕۆژگار دەبنە پاژێ لە سروشتی و ئیدی لە کۆڵ کەوتنەوەیانە ئەستەمە.

بینێرێتە قوتابخانە تاکوو قورئان فێر بێ. پاش ئەوە بیپەرژێنێتە سەر فێربوونی حەدیس و چیرۆکی پارێزکاران و شێوە ژیانی یارانی پێغەمبەر و پێشوونان. هەروەها نابێ ئیزن بدا خەریکی فێربوونی ئەو شیعرانە بێ کە بە ئافرەتاندا هەڵدەڵێن. هەروەها نەهێڵێ توخنی شاعیرێ کەوێ کە دەڵێ: «تەبع بەو شیعرانە ناسک دەبێ»؛ چونکە ئەو کەسە شاعیر نییە، بەڵکوو شەیتانە کە تووی شاوەتی دەپژێنێتە دڵ.

کە منداڵ چاکەیەکی کرد، یا خۆ ئاکارێکی جوانی بوو، ئافەرینی پێ بڵێ و پەسنی بکاو لە لای خەڵکی بیدوێنێ و تاریفی بداتەوە و شتێکی پێ بدا تا دڵخۆش بێ. ئەگەر تووشی هەڵەیەک هات، یەک دوو جار چاوی لێ بنووقێنێ و هیچی پێ نەڵێ، بە تایبەت ئەگەر لە نهێنیدا ئەو کارەی کرد؛ چونکە ئەگەر سەرکۆنەی کاتەوە، حەیای دادەماڵێ و بە ڕاشکاوی خراپە دەکا. کە دووپاتەی کردەوە، لە تەنیاییدا لۆمەی کاو پێی بڵێ: «ئاگادار بە تاکەس ئەم خراپەت لێ نەبینێ، چونکە تەپڵی ڕسواییت لێ دەدرێ و لە لای خەڵکی سووک و بێ بایەخ دەبی». باوک دەبێ ڕێز و حورمەتی خۆی ڕاگرێ و دایک منداڵەکەی لە بابی بترسێنێ.

نابێ بهێڵێ بە ڕۆژ بخەوێ، چونکە تەمەڵ و تەوەزل ڕادێ. هەروەها نابێ شەوانە لەسەر پێخەفی نەرم بخەوێ، تا بەهێز و بە ورە ڕابێ.

هەموو ڕۆژێ ماوەیەکی بۆ تەرخان کا بۆ یاری کردن، تاکوو لێهاتوو بێ و تووشی دڵتەنگی و ناوچاو تاڵی نەبێ و دڵی کوێر نەبێ. وای ڕابێنێ کە خۆی لە کەس زلتر نەزانێ و لە لای منداڵان خۆی هەڵنەکێشێ و چاوڕاو نەکا. لە منداڵان شت وەرنەگرێ، بەڵکوو دەهندە بێ و بڵێ: «وەرگرتن کاری دەرۆزەکەران و دەسندەخۆرانە».

هەروەها تەمای ئەستاندنی زێڕ و زیو و کاڵا لە خەڵکی، لە دڵیدا بکوژێ، چونکە دەکەوێتە سەر ڕێی نەمان و ئاوێتەی کاری دزیو دەبێ. دەبێ فێری کا، ئاوی دەم و لووتی لە لای خەڵک نەسڕێ و پشت لە خەڵک نەکاو بە ڕێزەو دانیشێ و دەست نەداتە ژێر چەناگەیا؛ چونکە ئەوە هۆی سستییە؛ هەروەها دەبێ ڕایبێنێ زۆربێژ نەبێ، تا لێی نەپرسن وەدەنگ نەیێ، زاری بە جنێو و لەحنەت نەگەڕێ؛ کە مامۆستای لێدا، هاوار و دەنگەدەنگ نەکاو شین و شەپۆڕ هەڵنەدا و پشوودرێژ و هێمن و بەشێنەیی بێ و بڵێ: «ئەمە کاری پیاوانە و شین و شەپۆڕ کاری ژنان و ئافرەتانە».

کە بووە حەوت ساڵان، بە میهرەبانی و دڵۆڤانی نوێژی پێ فێرکا. ئەگەر لە دە ساڵاندا لە نوێژ

خوێندن کورتییەکی کرد، لیێ بدا و رایبێنێ.

دزی و حەرامخۆری و درۆبێژی لە بەرچاوی کرێت کا و بەردەوام خراپەیان بێژێ.

کەوای راهێنا، هەر کات گەورە بوو، رازی ئەم داب و نەریت و هەڵس‌وکەوتانەی بۆ ئاشکرا کاو بلێ: مەبەست لە خواردن ئەوەیە، مرۆڤ هێزی بەجێ‌هێنانی بەندەگی پەروەردگاری بێ؛ دونیا بۆ تویشووی دوارۆژە و لەگەڵ کەس تا سەر نامێنێ و رۆژێ لەپڕونەکاو جێت دێڵێ، ژیر و هۆزان ئەو کەسەیە، لەم سفرەیە توێشووی دوارۆژی هەڵبگرێ و خۆ بگەیێنێتە بەهەشت و رەزامەندی پەروەرندەی بەدەس بێنێ؛ ئینجا دانستەکانی بەهەشت و دۆژەهی پێ بلێ و پاداش و سزای کردەوەکانیشی بۆ ئاشکرا کا. ئەگەر هەر لە سەرتاوە بە تەکووزی رایهێنا، ئەم پەیڤانەی وەکوو نەخشی سەر بەردن؛ ئەگەر زۆری گوێ پێ نەدابێ، وەکوو خۆڵ لەسەر دیوار دادەوەرێ.

سەهلی توستەری دەڵێ: سێ ساڵان بووم. شەوێ سەیری خاڵم - محەممەدی سوار- دەکرد، خەریکی نوێژ بوو. پێی گوتم: «رۆڵە گیان! ناتەوێ جارێک یادی ئەو خودایەی ئافراندووتی‌کەی؟» گوتم: «چۆنی یادکەم؟» گوتی: «شەوان کە دەرۆیتە نێو پێخەف سێ جار بە دڵ -نەک زمان- بلێ: "خوا لەگەڵمە، خودا سەرنجم پێ دەدا، خوا هەمووکات دەمبینێ"». چەن شەو وامگوت، تا پێمی گوت: «هەر شەو حەوت جار بیلێ»؛ حەوت جار گوتم. پاشان گوتی: «شەوێ پانزە جار بیلێ»، ئەوەشم گوت. ئەو گوتنانەم لە دڵ شیرین بوو. پاش رابوردنی ساڵێ پێێ گوتم: «ئەوەی پێم گوتی لە بیرت بێ و بەردەوام بیلێ، تا ئەو رۆژەی دەتنێنە نێو گۆڕ، چونکە ئەم پەیڤە لە دونیا و دوارۆژدا دەبێتە دەست گیرت». چەن ساڵ رابورد. لە دڵمدا زۆر شرین بوو. رۆژێک خاڵم پێی گوتم: «ئەوەی پەروەرندەی دەگەڵی بێ و سەرنجی پێ بدا و سەیری بکا، گوناح ناکا. ئامان گوناح نەکەی! چونکە پەروەرندەت چاوی لێتە». نرامە بەر خوێندن. بیر و هۆشم زوو بە زوو تێک دەچوو، گوتم: «هەر رۆژ زۆرتر لە سەعاتێ مەمنێرن»، تا قورئان فێر بووم، لەو کاتەدا حەوت ساڵان بووم. کە بوومە دە ساڵ تا دوازدە ساڵان بەردەوام رۆژووم دەگرت و نانی جۆم دەخوارد. سێزدە ساڵان بووم پرسێکم بۆ هاتە گۆڕێ، گوتم: «بۆ بەسرەم بنێرن تا لە زانایانی ئەوێ پرسیارکەم»، ناردمیان. لە هەموو زانایانی ئەو دەڤەرم پرسی، کەس نەیزانی. کەسێکیان لە ئابادان پێ ناساندم، رۆیشتمە لای؛ بۆی چارەسەر کردم. ماوەیەک لەگەڵی بووم، پاشان گەڕامەوە زێدی خۆم و یەک درهەم جۆم کڕی و رۆژووم بە نانی جۆ دەکردەوە، بەبێ پێخۆر. یەک ساڵم بە یەک درهەم رابوارد. وام بڕیاردا کە سێ رۆژان هیچ نەخۆم، هیچم نەخوارد و پێی راهاتم.

پاشان بڕیاری پێنج رۆژم دا، ئینجا حەوت، تا گەیاندمە بیست و پێنج شەو و رۆژ کە هیچ نەخۆم تا ئێستا بیست‌وپێنج ساڵە بەم چەشنە دەژیم و هەموو شەوێ، شەونخوونی دەکێشم».

ئەم چیرۆکەم بۆیەگێڕاوە تا لێت خویان بێ کە تووی هەر کارێکی گەورەو گرینگ لە منداڵیدا دەچێنرێ.

**ڕاڤەی مەرجەکانی مورید لە سەرەتای کۆشەوە و چۆنییەتی کۆشەوە لە ڕێ دیندا**

ئەوەی بە پەروەرندەی نەگەیشت، هی ئەوەیە ڕێی نەبڕیوە؛ ئەوەی ڕێی نەبڕی، هۆی ئەوەیە نەیویستووە؛ ئەوەی نەیویستووە، هۆی ئەوەیە نەیزانیوە و بڕوای قایم نەبووە. چونکە، هەرکەس بزانێ دونیا خۆشی تێکدەرەو قەد تا سەر نییە و ڕۆژی پەسلان هەتا هەتایی و پالفتەکەرە، پاپای دەستخستنی توێشووی دواڕۆژی لە دڵ دێتە دی و بۆی گران نییە شتێکی سووک و کەم نرخ بدا و شتێکی بەنرخ و هێژا بسێنێ؛ چونکە ئەگەر ئەمڕۆ گۆزە قوڕینە بدەیت و سبەینێ گۆزەی زێڕین بستێنێ، زۆر گران نییە.

هۆی هەمووی ئەمانە، کزی ئیمانەو هۆی کزی ئیمان، نەمانی ڕێبەرانە؛ چونکە ڕێبەر و ریزان و ڕێنوێنی ڕێی دین، زانایانی پارێزکارن و ئەمانەش نەماون. ڕێگا بەتاڵە و خەڵکوخواش ئاگایان لە بەختەوەری خۆ نەماوە.

لە زانایان ئەوەی ماوە، خۆشەویستی دونیا هەموو دڵی داگرتووە. کە خۆیان هەڵوەدای دونیان، چۆن خەڵک لە دونیا بەرەو دواڕۆژ بانگێشتن بکەن؟ ڕێگای دونیا بە پێچەوانەی ڕێی دواڕۆژە، وەکوو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوان بۆ یەک؛ نزیکی هەر یەکیان دەکەوی، لەویتریان دوور دەکەوی. ئەوەی تامازرۆیی گەیشتن بە پەروەرندەی کەوێتە دڵ و بڕواتە ریزی ئەوانەی خودا گوتی: وَمَنْ أَرَادَ ٱلْآخِرَةَ ، دەبێ بزانێ واتای وَسَعَىٰ لَهَا [1]سَعْيَهَا چییە و ئەو «سعی»ە کامە. دەبێ بزانی ئەو کۆشەیە ڕێگابڕینە. یەکەم مەرجی ڕێڕەویش ئەوەیە کە سەرەتا بکەوێتە سەر ئەم ڕێگایە؛ پاشان گورێسێک هەیە دەبێ بەچنگ بیگرێ و ئینجا شوورە و دیوارێک هەیە دەبێ خۆی لەپەنای ڕابگرێ.

**پەردەکانی نێوان خودا و خەڵکی**

ڕێبگار دەبێ سەرەتا پەردەی نێوان خۆی و خودا هەڵداتەوە، تا لەو تاقمە نەبێ کە پەروەردگار پێی گوتن: وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ [2]سَدًّا.

---

١ ـ قورئان (١٩/١٧) کێش خۆشی ئەو دونیای دەوێ و ـ بە پێی توانا ـ بۆی دەکۆشێ و باوەڕدارە، کۆششیان بە فێڕۆ ناچێ و لەبەر چاوە. (هـ).

٢ـ قورئان (٩/٣٦) لەمپەرێکمان لە پێشیانەوە داناوەو لەمپەرێک لە پشتیانەوە؛ تارماییشمان هاویشتە سەر گلێنەیان کە نابینن. (هـ).

پەردە چوارن: سامان و پاگەو پەیڕەوی و گوناح.

**سامان** بۆیە دەبێتە لەمپەر، چونکە دڵ دەپەرژێنێتە سەر خۆ و کەچی بۆ ڕێگابڕین دەبێ دڵ سووک و ئازاد بێ؛ دەبێ سامانەکەی لەسەر ڕێ لاباو تەنیا ئەوەندەی گەرەکە بۆ ڕێ بڕین، بێڵێتەوە و بەس، چونکە ئەوەندەی کە نیازی ڕێگا بێ، دڵ خەریکی خۆ ناکا. ئەگەر کەسێک بۆ خۆی هیچی نەبێ و کەسێکیتر بژیوی ژینی دابین کات، خێراتر ڕێگا دەبڕێ.

لەمپەری **پلە و پاگە** بەم جۆرە لادەدرێ کە هەڵبێ و بڕواتە شوێنێ کە کەس نەیناسێ؛ چونکە ئەگەر بەناوبانگ بوو گیرۆدەی پێشوازی و رووگەشی خەڵک دەبێ و ئەوەش پەرژایە سەر خەڵک بیری لە خوا دوور دەکەوێ.

**پەیڕەوی** بۆیە دەبێتە پەردە لە نێوان بەندە و خودا، چونکە کاتێ کەسێک کەوتە دووی بیروڕای کەسێکیتر و بۆ شەڕەقسە گوێی لە پەیڤی گرت، ئیدی هیچ ڕاستەقینەیەک ڕێ ناباتە سەر دڵی. دەبێ ئەو بیروڕایە لە بیر باتەوەو باوەڕی بە واتای «لا اِلهَ اِلاّ اللّه» بێ و گەیشتن بەو باوەڕەی لە خۆی بوێ. ئەو گەیینە وایە کە هیچ پەروەردگارێ بێجگە لە خوای بۆ نامێنێ کڕنۆشی بۆ باو ئەوەی شاوەتی بە سەردا زاڵە، شاوەت دەبێتە خودای. کە ئەم ڕاستیەی لێ ئاشکرا بوو، دەبێ بە کۆشەوە پەردە لەسەر ڕاستیەکان لابدا، نەک شەڕەقسە.

بەڵام **گوناح** گەورەترین پەردەیە؛ چونکە ئەوەی لەسەر گوناح پادابگرێ، دڵی ڕەش و تاریکە: چۆن لە ڕاستی دەگا؟ بە تایبەت خواردنی حەرام؛ چونکە هیچ شت وەکوو خواردنی حەڵاڵ ڕووناکی دەروون پتر ناکا. دەبێ خۆی لە حەرام ببوێرێ و بێجگە حەڵاڵ چیدی نەخوا. ئەوەی بە تەمابێ لە ڕاز و نهێنیەکانی دین و شەرع بگا، بەبێ ئەوەی بە کردەوە ڕواڵەتی شەرع بەجێ بێنێ، وەکوو ئەوەیە کەسێک بەبێ ئەوەی زمانی تات فێر بووبێ، نیازی فێربوونی ڕاڤەی قورئانی بێ.

**ڕێنۆما**

کە ئەم پەردانەی لادا، وەکوو ئەو کەسەیە کە تارەتی گرتووە و دەسنوێژی شۆردووە و بۆ خوێندنی نوێژ تەیار بووە. ئێستا پێویستی بە ئیمامە تا پەیڕەوی بکا. ئەو ئیمامەش پیرە؛ چونکە بێپیر و ڕێزان ڕێگابڕین هەڵەیە: ڕێگا بەرپیوار و پڕهەڵدێرە؛ ڕێگای شەیتانی تێکەڵە. ڕێی خوا یەکە، کەچی ڕێی شەیتان هەزارە، کەوابوو ڕێڕەو بەبێ ڕێنما چۆن ڕێگا دەبڕێ؟ کە پیرێکی دیەوە، دەبێ کار و کردەکانی بەو بسپێرێ و بە تەواوی خۆی بداتە دەستی پیر و چاک بزانێ قازانجی ئەو لە هەڵەی پیردا پتر لە دروستی خۆیە. هەر شتێکی بیست کە بە ئاوەزی خۆی فامی نەدەکرد، چیرۆکی مووساو خدر -دروودی خوایان لە سەر- بێنێتەوە یاد، چونکە ئەوە چیرۆکی ڕێبەر و پێرەوە. مەشایەخ

شتگەلێ دەزانن کە ئاوەز ڕێ ناباتەسەریان.

لە سەردەمی جالینووسدا قامکی کابرایەک نیشتە ژان. پزیشکانی هیچ نەزان دەرمانی زۆریان بۆ نوان، هیچ چاری نەکرد. جالینووس دەرمانییێکی نایە سەر شانی کابرا، گوتیان: «زۆر گێلۆکەیە! کابرا قامکی دێشێ، ئەم دەرمان دەنێتە سەر شانی، کەلکی چییە؟» قامکی کابرا چاک بوومەوە. جالینووس زانیبووی هۆی ئەو ژانە دەماری سەرەکییە و ئەو دەمارەش لە مێشکڕا دێتە سەرشان و لەوێوە بە شانیتردا دەگەڕێ؛ هەروەها ئەوەی لە چەپەوە هەستابێ، بەرەولای ڕاست دەڕواو ئەوەی لە ڕاستەوە خێزیابێ، بەرەو چەپ دەڕوا.

مەبەست لەم چیرۆکەش ئەوە بوو کە بزانی لە دەروونی مورید هیچ کەس بێجگە لە موراد چاتر نازانێ. خواجە بووعەلی فازموزی بۆی گێڕامەوە گوتی: «جارێک خەونێکم بۆ مامۆستام -ئەبولقاسمی گورگانی کە- گێڕایەوە. لێم زیز بوو و یەک مانگ لەگەڵم قسەی نەکرد. هۆکەیم نەدەزانی تا ئەوەی پێی گوتم: «لەو خەونەی کە بۆت گێڕامەوە گوتت" تۆ -کە مامۆستای منی- شتێکت پێ گوتم و منیش گوتم: بۆ چی؟" ئەگەر لە دەروونتدا "بۆچی؟" نەبوایە، نەدەهاتە خەونت و لە خەویشدا نەتدەگوت»».

کە خۆی بە پیرێ ئەسپارد، یەکەم کاری ئەو پیرە ئەوەیە کە لە ژوورێکی باوێژێ، تا لە زیان بە دوور بێ. ئەو ژوورە چوار دیواری هەیە کە بریتین لە: تەنیایی و بێدەنگی و برسێتی و بێخەوی. برسێتی ڕێی شەیتان دەبەستێ، کەم نووستن دڵ ڕووناک دەکاتەوە، بێدەنگی پەیڤی ئاڵۆز لە دڵ دەسڕێ و تەنیایی تاریکی سێبەری خەڵکی لە دڵ لادەباو ڕێی چاو و گوێ دادەخا.

سەهلی توستەری دەڵێ: «عەودالان بە تەنیایی و برسێتی و بێدەنگی و بێخەوی، بوون بە ئەبدال».

پاش ئەوەی ڕێگرانی ڕێ لەناو برد، دەبێ درێژە بە ڕێگابدا. سەرەتا دەبێ کۆسپەکانی ڕێ ببڕێ. دژوارییەکانی ڕێ ئەو دانستە دزیوانەن لە دڵ جێیان گرتووە. ئەوانەش هۆی هەموو گوناحەکانن، وەکوو شاوەتی ماڵوسامان و پلە و پاگە و لووت بەرزی و دوڕوویی و.... دەبێ دڵیان لێ هەڵاوێری و خالی کەیتەوە. ڕەنگە یەکێک لە هەموو ئەمانە پاکژ بێ بێجگە یەکیان. بۆ ئەو یەکەش بە گوێرەی ڕاسپاردەی پیر، دەبێ بجووڵێتەوەو خۆی لێ خاوێن کاتەوە. ئێستا کە زەوینی پاقژ کردەوە، دەبێ تووی تێدا بچێنێ؛ توو بریتیە لە یادی پەروەرندەی گەورە، کاتێ دڵ لە هەموو کەس بێجگە لە خوا پاکژ بۆوە. پاش ئەمانە لە سووچێکدا دابنیشێ و خۆی لە خەڵکی دابڕێ و بەردەوام «الله الله» بڵێ تا ئەوەی زمانی وس بێ و بە دڵ بیڵێ. پاش ئەوە دڵیش لە وتن واز دێنێ و واتای ئەم پەیڤە بەسەر دڵدا زاڵ دەبێ؛ ئەو واتای کە لە پیت و دەنگ بەدەرە، نە عارەبی و نەکوردییە. چونکە گوتن بە

دڵیش قسەکردنە و پەیڤ و قسەش توێکڵ و پێستی ئەم تووەیە نەک تووەکەی خۆی. کەواتە، دەبێ ئەم واتایە لە دڵدا سەقامگیر بێ و بەسەر دڵدا زاڵ بێ، بە چەشنێ کە بۆ گوتنی زۆر لە دڵ نەکرێ، تەنانەت بە زۆریش دڵی لێ جیا نەکرێتەوە.

شبلی بە موریدی خۆی -حەسری- گوت: «ئەگەر لەم هەینیە تا ئەم جومعەیتر کە دی بۆ لام، یادی کەسێک بێجگە لە خودات کەوتە دڵ، هاتن بۆ لای منت لێ حەرام بێ».

کە دڵ لە وازوازی دونیا خاڵی کراوە و ئەم تووە چاندرا، ئیدی هیچ شتەک کە بە پێی ویست و ئیرادە بێ بۆ مورید نامێنێ، ئیرادە تا بە ئیرەیەو بەس. لەمە بە دوا دەبێ چاوەنۆڕ بێ و بزانێ چ دەبێ و چ روودەدا.

زۆر جار وایە ئەم تووەی چاندرا، ئیدی زیان ناکا و بە خەسار ناڕوا، چونکە پەروەردگار فەرمووی: مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ[1] واتە، هەرکەس داهاتی دواڕۆژی بوێ و توو بچێنێ، ئێمە پتر لەوەی دەدەینێ.

لێرەدا بارودۆخی موریدەکان جۆراوجۆرە: کەسی وا هەیە کە واتای ئەم وشەیەی بە راشکاوی بۆ خویان دەبێ و خەیاڵی پووچەڵی بۆ دێتە دی. یەکی واش هەیە کە لەمانە بەدەرە، کەچی گەوهەری فریشتەکان و رۆحی پێغەمبەران لە رواڵەتی بەدەو جوان بۆی خویان دەبێ، وەکوو ئەوەی لە خەودا بێ؛ کەچی خەو نییە و خەوەرە. بێجگە لەمانەش بارودۆخیتر هەیە کە لەوتن نایەن، چونکە ئەم رێگا، رێی رۆیینە نەک گوتن، لە گوتنیشیدا هیچ کەڵکێ نییە و هەرکەس شتێکی تایبەتی بۆ دێتە دی. ئەوەی رێ دەبڕێ باشتر وایە هیچی نەبیستبێ؛ چونکە چاوەنۆڕی گەیشتن بەو دۆخە دڵی دەپەرژێنێتە سەر خۆ و دەبێتە پەردەیەک لە نێوان مورید و خودادا.

ئەو رادەی کە زانست رێی تێ دەبا، تا ئیرەیە. مەبەست لەم باسە ئەوەیە تا باوەڕی پێ بهێنی؛ چونکە زۆربەی زانایان دانی پێدا نانێن و ئەوەی لە تخووبی فێرکردنی ئاسایی تێپەڕا، باوەڕی پێ ناهێنن.

---

[1] ـ قورئان (٤٢/٢٠).

## بنەمای دووەم - لە کۆسپەکانی ڕێی دین، ئارەزووی سک و ژێر سکە

دەبێ بزانی کە گەدە، ئەستێری لەشەو ئەو دەمارانەی لێیەوە دەبن و بە حەوت ئەنامدا دەگەڕێن، وەکوو جۆگەن و سەرچاوەی هەموو شاوەتەکان گەدەیە. ئەمە زاڵترین شاوەتە بەسەر مرۆڤدا. تەنانەت وەدەرنرانی مرۆڤ لە بەهەشت، بە بۆنەی ئەم ئارەزووەوە بوو. ئەم شاوەتە، سەرچاوەی شاوەتەکانی‌ترە؛ چونکە کاتێ زگ تێر بوو، شاوەتی ژن هێنان دەجوێتەوە. شاوەتی زگ و ژێر زگ تەنیا بە ماڵوسامان دەگەنە ئاوات؛ کەواتە، شاوەتی ماڵ دێتە دی. سامانیش نایەتە دەست، مەگین بە پلە و پاگە و گەورەیی؛ کەواتە شاوەتی پلە و پایە دێتە دی. ماڵوسامان و پلە و پاگە ڕاناگیرێ، مەگین بە دوژمنی لەگەڵ خەڵکوخوا؛ بۆیە لەوەش ڕژدی و دەمارگیری و دوژمنایەتی و لووتبەرزی و دوڕازی و ڕق و قین و شەڕ دێتە دی.

### دەرمانی شاوەتی ورگ

بەرهەڵداکردنی ورگ، سەرەتای هەموو گوناحەکانە و هێنانە ژێر ڕکێفی ورگ و خوو کردن بە برسیەتی، بنەمای هەموو خێر و ودمێکە.

لەم بەشەدا هێژایی برسییەتی دەڵێین، پاشان قازانجەکانی برسیەتی ئاشکرا دەکەین، ئینجا ڕێی کۆشەوە بۆ کەمخواردن دەنوێنین، دواتر جیاوازی بارودۆخی خەڵک شرۆڤە دەکەین، پاشان ئافەتی دوڕازی بە کەمخواردن دەڵێین، دوای ئەوە ئافەتی شاوەتی ژێرسک و پاداشی ئەو کەسەی خۆی لەم شاوەتە بپارێزی دەڵێینەوە.

### شرۆڤەی هێژایی و پاداشی برسییەتی

پێغەمبەر فەرمووی: «بە برسیەتی و تینوێتی لەگەڵ خۆ شەڕکەن، چونکە پاداشی ئەوە وەکوو پاداشی شەڕ لەگەڵ کافرانە و لە لای پەروەردگار هیچ کردەیەک بە قەدەر برسیەتی و تینوێتی هێژا نییە». فەرمووی : «ئەوەی ورگی ئاخنی، ڕێ نادەنە مەلەکووتی ئاسمانەکان». لە پێغەمبەریان

پرسی: «هێژاترینی خەڵک کێیە؟» فەرمووی: «ئەوەی کەم بخواو کەم پێبکەنێ و بە داپۆشینی شەرمگای قنیات بکا». دیسان فەرمووی: «گەورە و سەرۆکی هەموو کردەوەیەک برسیەتییە». دیسان فەرمووی: «جلک دەبەرکەن و بخۆن و بخۆنەوە بە قەدەر نیوەی سکتان، چونکە ئەوە پاژێکی پێغەمبەرایەتییە». دیسان فەرمووی: «رامان نیوەی عیبادەتە و کەمخواردن سەرجەمی عیبادەت».

دیسان گوتی: «هێژاترینتان لە لای پەروەردگار ئەو کەسەیە کە رامان و برسیەتیەکەی درێژتر بێ؛ دوژمنترینتان لە لای پەروەردگار ئەو کەسەیە کە خۆراکی زۆر بخوا و ئاوی زۆر بخواتەومو زۆریش بنوێ». دیسان فەرمووی: «پەروەردگار لە لای فریشتەکان شانازی دەکا بەو کەسەی کە کەم دەخوا، دەڵێ: "بڕوانن! هەر چەند تووشیاری ئارەزووی خواردنم کرد، کەچی بە بۆنەی منەوە وازی لێ هێنا؛ ئاگادار بن ئەی فریشتەکان! بە قەدەر هەر پارووەیەک کە نەیخوارد، پلەیەک لە بەهەشت سەری دەخەم"». گوتی: «بە زۆر خواردن و خواردنەوە دڵتان مەمرێنن، چونکە دڵ وەکوو مەزرایە: بە ئاودێری زۆر دەمرێ و گەشە ناکا». دیسان فەرمووی: «مرۆڤ هیچ دەفرێکی خراپتر لە ورگ، پڕ نەکرد. بۆ مرۆ چەن پارووەیەک کە پشتی پێ راستەوە بێ بەستە؛ گەر چار نەبوو، سێ‌یەکی ورگی خۆراک بخواو سێ یەکی ئاو و سێ‌یەکی بۆ هەناسە راگرێ»؛ بە گێڕانەوەیەکی تر «سێ‌یەکی بۆ یادی خوا».

عیسا گوتی: «بە برسیەتی و رووتی بژین، بەڵکوو دڵەکانتان بە دیداری خودا بگەشێتەوە». پێغەمبەر فەرمووی: «شەیتان لە لەشی مرۆدا. دەسووڕێتەوە، وەکوو خوێن لە دەماردا. بە برسیەتی رێگای پێ تەنگ کەن». دیسان فەرمووی: «بڕوادار بە یەک ریخۆڵە دەخواو دوڕاز بە حەوت»؛ واتە، شاوەت و خواردنی دوڕاز حەوت جار پتر لە بڕوادارە.

عایشە گوتی، پێغەمبەر پێی گوتین: «بەردەوام دەرگای بەهەشت بکوتن تا بۆتانی بکەنەوە». گوتم: «ئەی پێغەمبەری خوا! چلۆن؟» فەرمووی: «بە برسیەتی و تینوێتی». ئەبووجوحەیفە لە لای پێغەمبەر قورقێنەیەکی لێ دا، پێغەمبەر پێێ گوت: «ئەم قورقێنەتە دوور بگرە؛ چونکە ئەوەی لەم دونیادا تێرتر بوو، لەو دونیادا برسیترە». عایشە دەڵێ: «پێغەمبەر قەد تێری نەخوارد، وابوو کە بەزەییم پێیدا دەهات و دەستم بەسەر زگیدا دەکێشا و دەمگوت: "بە قوربانت بم! چ دەبێ ئەگەر لە دونیا ئەوەندە بخۆی کە برسی نەبی؟" فەرمووی: "ئەی عایشە! پێغەمبەرانی ئولولعەزم -برادەرانی من- پێشتر رۆیشتن و لە پەروەردگار بەزەیی و دلۆڤان زۆریان بینی؛ دەترسم ئەگەر خۆشی رابوێرم ئاستی من لەوان کەمتر بێ. چەن رۆژێ بەکەم رایدەبوێرم، تا دوارۆژ بەهرەی زۆرترم پێ بگا. هیچ شت لە لام هێژاتر لەوەی نییە کە بگەم بە براکانم"». عایشە دەڵێ: «سوێند بە خودا! پێغەمبەر پاش ئەمە پتر لە حەوتەیەک نەژیا».

فاتیمە لەتێ نانی لە دەستدا بوو، ڕۆیشتە لای پێغەمبەر. فەرمووی «ئەمە چییە؟» گوتی: «نانێکم کرد، بەبێ تۆ پێم نەخورا». فەرمووی: «لە سێ ڕۆژی لەمەوبەرەوە تا ئێستا ئەمە یەکەم خواردنێکە کە بابت دەینێتە سەر زاری». بووهورەیرە دەڵێ: «بنەماڵەی پێغەمبەر قەد سێ ڕۆژ بەردەام نانی گەنمینیان نەخوارد».

ئەبووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «شەوانە پارووێک کەمتر بخۆم، پێم خوشترە تا بەیانی شەونوێژ کەم». فوزەیل بە خۆی دەگوت: «لە چی دەترسی؟ دەترسی کە برسی بمێنیەوە؟ مخابن! پەروەردگار برسیەتی دەداتە موحەممەد و یارانی. تۆ و وەکوو تۆ بچووکتر لەوەن برسیەتیتان بکاتەبەش». کەهمەس دەیگوت: «پەروەرندەم! بە رووت و برسی رام دەگری، بە درێژی شەوان لە تەنیایی خۆتم دادەنی، ئەم پلە و پاگەم لە لای تۆ چلۆن بە دەست هێناوە؟ چونکە تۆ ئەم چاکەیە دەگەڵ یارانی خۆت دەکەی». مالکی دینار دەیگوت: «خۆزگە بەوەی ئەوەندە خەلەوخەرمانی هەیە کە لە خەڵک بێنیاز دەبێ». موحەممەدی واسیع گوتی: «نە! خۆزگە بەو کەسەی کە بەیانیان برسیەو شەوانەش برسیە و لە پەروەرندەی شادوشوکرە». سەهلی توستەری گوتی: «گەورەکان و برواداران ڕامان و تێگەیشتن کە هیچ شتێ بۆ دین و دنیا بە قازانجتر لە برسیەتی نییە و هیچ شت بۆ دوارۆژ زیانبارتر لە تێری نییە».

عەبدولواحیدی زەید گوتی: «پەروەردگار کەسی بە دۆستی نەگرت، مەگین بە برسیەتی، کەس نەیتوانی بەسەر ئاودا ڕێ ببڕێ مەگین بە برسیەتی، کەس نەیتوانی شەوێ پتر لە سەد فرسەنگ ڕێ ببڕێ، مەگین بە برسیەتی. لە خەبەردا هاتووە کە لەو چل ڕۆژەی کە پەروەردگار لەگەڵ مووسا ئاخاوت، مووسا هیچی نەخوارد».

## شرۆڤەی قازانجەکانی برسیەتی و زیانی تێری

خێروودمی برسیەتی، بەبۆنەی ڕەنج و دژواری برسیەتی نییە، هەر وەکوو چۆن قازانجی دەرمان تاڵی نییە. بەڵام لە برسیەتیدا دە قازانج هەیە:

**قازانجی یەکەم**: دڵ پاک و ڕوون دەکاتەوە؛ تێری دڵی مرۆ کوێر و بیری کول دەکا؛ هەڵمێ کە لە گەدەوە دەنیشێتە سەر مێشک و مرۆڤ گێل و ساویلکە دەکا و بیر و هرزی ئاڵۆز دەکا. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «دڵتان ببووژێننەوە بە کەم پێکەنین و پاکژی کەنەوە بە برسیەتی تا نەرم و پاراو بێ». دیسان فەرمووی: «هەرکەس بە برسیەتی خۆی ڕاگرێ، بیری مەزن و زەینی تیژ دەبێ». شبلی گوتی: «ڕۆژ نەبوو برسی بم لە بۆ خودا و لە دڵمدا لێزانی و هۆزانیەکم بۆ نەیەتی دی». پێغەمبەر فەرمووی: «تێر مەخۆن؛ چونکوو تێری تیشکی زانین لە دڵتاندا دادەمرێنێ». کەواتە،

چونکە زانست ڕێی بەهەشتە و برسیەتی دەرگای زانستە، برسی‌بوون کوتانی درگای بەهەشتە؛ هەروەک فەرمووی: «أديموا قَرعَ باب الجَنَّة بالجوُع».

**قازانجی دووەم**: دڵ بە چەشنێ ناسک دەبێتەوە کە بیرو ویری پەروەردگار چێژی زۆری پێدەگەینێ. کەچی تێری سفت و سەختی دەکا و هەر یادێ کە دەکرێ، لە زار تێناپەڕێ و ناگاتە ناخی دڵ. جونەید دەڵێ: «هەرکەس لە ئەنگۆ لە نێوان خۆی و خوادا خوانێکی ڕەنگینی داناوە و دەیەوێ لە عیبادەت چێژ ببا، خەیاڵێکی بەتاڵە».

**قازانجی سێهەم**: مەستی و بێهۆشی لە سەر ڕێگای دۆژەهە و بێدەرتانی و بێچارەیی و دۆشداماوی لە سەر ڕێی بەهەشتە؛ تێری مەستی دێنێ و برسیەتی بێهێزی و شکان. مرۆڤ تا لە بێهێزی و بێتوانی خۆی نەگا -کە پارووەکی لە بەردەم کەم دەبێتەوە، دونیای لەبەر چاو تەنگ و تاریک دەبێ- لە گەورەیی پەروەرندەی ناگا. بەم بۆنە بوو کە کلیلی خەزانەکانی سەرزموینیان دا بە پێغەمبەر و ئەو گوتی: «نامەوێ، مەگین ڕۆژێ تێر و ڕۆژێ برسی: کە برسی بووم خۆم ڕادەگرم، کە تێر بووم شوکرانەبژێری دەکەم».

**قازانجی چوارەم**: مرۆڤ کە تێر بوو، نە دەکەوێتە بیری برسی، نە بەزەیی بە خەڵک‌وخوادا دێتەوە و نە دوارۆژی دەکەوێتە بیر؛ کە برسی بوو، برسییەتی جەحەندەمیانی دەکەوێتە یاد؛ کە تینوو بوو، تینوێتی ڕۆژی پەسلانی دەکەوێتە بیر. ترس لە دوارۆژ و بەزەیی هاتن بە بەندەکانی خوا لە دەرگاکانی بەهەشتن. بەم بۆنە بوو کاتێ لە یووسفیان پرسی: «تۆ کە سەرپەرشتی هەمارەکانی سەرزەویت، بۆچی هیچ ناخۆی و بەبرسیەتی دەژی؟» گوتی: «دەترسم ئەگەر تێر بم، هەژارانی برسی لە بیرکەم».

**قازانجی پێنجەم**: ئەم قازانجە لە لای سەرووی هەموو قازانج و بەختەوەرییەکانە، ئەوەش کۆتی بەندەگی کردنەملی نەفسە لە بەر پێی دڵدا و چارەڕەشی و بەخت نخوونی ئەوەیە کە دڵ بڕواتە ژێر ڕکێفی نەفس؛ هەر وەکوو چۆن ئەسپی سەرکەش و شەمووز و تووش بە برسیەتی دەستەمۆ دەکرێ، نەفسیش هەروایە. ئەمە بە تەنیا قازانجێک نییە، بەڵکوو کیمیای قازانجەکانە؛ چونکە هەموو گوناحەکان لە سۆنگەی شاوەتەوە دێنە دی و وره و هێزی شاوەتیش تێری دابینی دەکا.

زونون دەڵێ: «قەد نەبووە تێر بخۆم و تووشی گوناح نەبووبێتم، یا خۆ ئارەزووی گوناحم نەکەوتبێتە دڵ».

عایشە دەڵێ: «یەکەم داهێنانێ پاش پێغەمبەر هاتەدی، تێری بوو، کاتێ ئەم نەتەوە تێریان خوارد، نەفسیان بزوت و سەربزیو بوو».

ئەگەر برسیەتی بێجگە لە لاوازکردنی شاوەتی ژێرسک و سڕینەوەی شاوەتی ئاخاوتن، هیچیدی

نەکا، بەستە؛ چونکە هەرکەس تێر بخوات دەپەرژێتە سەر قسەی پڕوپووچ و شاوەتی ژێرسک سواری ملی دەبێ.

ئەگەر شەرمگای بپارێزێ، دەبێ چاوی بپارێزێ، بۆ پاراستنی چاویش دەبێ بیر و خەیاڵی بپارێزێ؛ برسیەتی هەموو ئەمانە پێکڕا جێبەجێ دەکا. بۆیە گەورەکان گوتوویانە: «برسییەتی گەوهەرێکە لە نێو خەزانەی پەروەردگار؛ نایداتە هەرکەس. تەنیا بەو کەسەی دەدا کە خۆشی دەوێ». هۆزانێ گوتوویە: «هەر پیرەوێ یەک ساڵی تەواو نانی خاڵی بخوا و نیوەی ئەوەی هەر جار دەیخوارد بخوا، پەروەرندەی بیری ژنانی لە دڵ لادەبا».

**قازانجی شەشەم**: کەمنووستن کە بنەمای سەرجەمی عیبادەت و بیر و ویر و یاد کردنەوەکانە، بە دانستە لە شەودا؛ هەرکەس بە شەو ورگی بئاخنێ، وەکوو مردوو خەو دەیباتەوەو تەمەنی بە فیڕۆ دەڕوا. یەک لە پیران هەموو شەوێ لەسەر سفرە بە دەنگی بەرز دەیگوت: «ئەی موریدەکان! نانی زۆر مەخۆن، چونکە ناچار دەبێ ئاوی زۆریش بخۆنەوەو ئینجا زۆر دەخەون و لە دواڕۆژدا هەناسەسارد دەمێننەوە». حەفتا زانا و راسبێژ رایان وایە کە ئاوی زۆر خواردنەوە دەبێتە هۆی زۆر نووستن؛ جا چونکە سەرمایەی مرۆڤ تەمەنیە و هەر هەناسەیەک گەوهەرێکە کە بەختەوەری دواڕۆژی پێ راو دەکرێ و خەون تەمەن بە خەساردەدا، چ شتێ هێژاتر لەوەیە کە خەو بڕەوێنێ؟ ئەوەی بە زگی هەڵمساو شەونوێژ کا، هیچ چێژێکی لێ ناباو خەو دایدەگرێ و تەنانەت رەنگە شەیتانی پێ پێبکەنێ و بەو شەو لەش پیسی پێ دەرنەکرێ و لە عیبادەت بێوەر بێ و رەنجی خۆشۆردنی کەوێتە بەر. ئەگەر بیەوێ بڕواتە گەرماو، رەنگە پارەی پێ نەبێ؛ یا خۆ رەنگە لە گەرماودا چاوی بە شەرمگای کەسێ بکەوێ و لەوەش زیانی زۆر دێتە دی. ئەبووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «لەش پیسی گوناحە»، مەبەستی ئەوەیە کە ئاسەواری تێرییە.

**قازانجی حەوتەم**: رۆژگار بۆی درێژ دەبێ و دەپەرژێتە سەر کار و زانست. ئەگەر زۆر بخوا، خواردن و لێنان و خەوتن و کڕین و چاوەڕوانیکردنی، کاتی زۆر دەباو هەموو کاتی دەبێ بپەرژێتە سەر دابینکردنی خواردن؛ پاش ئەوەش خاوێنکردنی جێ و کەلوپەل هەموو کاتی دادەگرێ. هەر هەناسەیەک گەوهەرێکە و سەرمایەی مرۆڤیش ئەوەیە: بەبێ پێویست فەوتاندنی بەڵگەی گێلی و گەوجییە.

سڕی سەقەتی دەڵێ: «عەلی گورگانیم بینی کە ئاردی جۆی دەخوارد. لێم پرسی بۆچی نان ناخۆی؟ گوتی: "مەوادی نێوان خواردنی ئەمە و نان حەفتا تەسبیحە، نامەوێ تەمەنم بفەوتێنم، بۆیە چل ساڵە نانم نەخواردووە تا ناچار بە جاوینی نەبم و ئەم قازانجەم نەفەوتێ"».بێشک ئەوەی خوو بە برسیەتی بکا، رۆژووی لەبەر ئاسانە و دەتوانێ لە مزگەفتدا دابنیشێ و هەموو کات پاک و خاوێن بێ.

ئەم قازانجانە بۆ ئەو کەسانەی کاری دوارۆژ دەکەن زۆر بە نرخ و هێژایە.

ئەبووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «ئەوەی بە خواردن ورگی بئاخنێ، شەش شتی بۆ دێتە دی: شیرینی عیبادەت نازانێ؛ مێشکی بۆ ئەزبەرکردنی زانست کول دەبێ؛ لەبەزەیی هاتن بە خەڵک بێبەش دەبێ، چونکە پێی وایە هەمووی خەڵک تێرن؛ عیبادەتی لا گران دەبێ؛ شاوەتەکانی زۆر دەبن؛ برواداران دەگەڕێنە دووی مزگەفتدا، کەچی ئەم دەگەڕێتە دووی ئاودەست و کناراودا».

**قازانجی هەشتەم:** ئەوەی کەم بخوا، هەموو دەم تەندروست و لەش‌ساغ و بە دوور لە ئێش و ژان و پزیشک و دەوا و دەرمانی تفت و تاڵە. هۆزان و پزیشکان گوتوویانە هیچ شت نییە کە هەمووی خێر و قازانج بێ و هیچ زیانی نەبێ، مەگین کەم خواردن. یەکێک لە پزیشکان گوتوویە: «چاترین و بەقازانجترین شت کە مرۆڤ بیخوا، هەنارە و خراپترینیان گۆشتی ویشک: بەلام کەم خواردنی گۆشت ویشک چاترە لە زۆر خواردنی هەنار». لە خەبەریشدا هاتووە کە: «ڕۆژوو بگرن تا تەندروست بن».

**قازانجی نۆهەم:** ئەوەی کەم بخوا، خەرج و بەرجی ژینی کەمترە و نیازی زۆر نییە. هەموو زیان و گوناح و دڵەراوکێکان لە سۆنگەی نیاز بە ماڵ‌وسامانەوە دێنە دی؛ چونکە هەموو ڕۆژێ لەو بیرەدایە کە شتی خۆش بخوا و زۆر بخوا، دەبێ بیر لە دابین‌کردن کاتەوەو ئاوڕ لە حەلاڵ و حەرام نەداتەوە. هۆزانێک دەڵێ: «زۆربەی نیازەکانم بە واز لێ‌هێنانیان پێک دێنم، ئەوەم پێ ئاسانترە». یەکێکتر دەڵێ: «کە قەرزم گەرەک بوو، لە ورگی خۆم دەسێنم و واز لە ئارەزووی نەفسم دێنم». ئیبراهیمی ئەدهەم نرخی شتێکی پرسی، گوتیان «گرانە». گوتی: «أَرخِصوهُ بِالتَّرکِ»؛ واتە: بەواز لێهێنانی هەرزانی بکەن.

**قازانجی دەهەم:** ئەوەی بەسەر ورگیدا زاڵ بوو، سەدەقەدان و بەخت‌کردن و دەهندەیی لا ئاسان دەبێ؛ هەرچی بڕواتە نێو ورگەوە، جێی پیس و ناپاکە و هەرچی بدرێتە سەدەقە، لە خەزانەی بەزەیی و دلۆڤانی پەروەردگاردا رادەگیرێ. پێغەمبەر سەیری ورگی هەڵمساوی زەلامێکی کرد و پێی گوت: «ئەوەی ڕژاندووتە ئێرە، بترژاندایەتە شوێنێکی‌تر بۆت چاتر بوو»؛ واتە: بۆ سەدەقە لە ڕێی خوا.

## شرۆڤەی داب و نەریتی مورید لە کەم خواردنی خۆراک و لە کاتی خۆیدا خواردن

مورید پاش ئەوەی لێی خویان بوو خواردنێ حەلالە، دەبێ ئاگای لە سێ شت بێ:

**یەکەم:** کەم خواردن؛ نابێ بە یەکجار لە زۆر خواردن بگاتە کەم خواردن، چونکە وزەی ئەو کارەی نییە و پێی ناکرێ و تووشی زیان دێ؛ بەڵکوو دەبێ بەرەبەرە بڕواتە پێشێ. بۆ وێنە ئەگەر ویستی بە قەدەر نانێ خۆراکی کەم کا، دەبێ ڕۆژی یەکەم، پاروویەک، ڕۆژی دووەم دوو پاروو و ڕۆژی سێهەم

سێ پاروو تا دەگاتە یەک مانگ کە سی پاروو کەم دەکاتەوەو دەبێتە نانێک. ئەگەر وایکرد، بۆی ئاسانە و تووشی کێشە نابێ و تەبعی خووی پێ دەکا.

ئەو کاتە ئەو رادەی بڕیاری لەسەر داوە چوار ئاستی هەیە:

**ئاستی یەکەم** گەورەترینە و ئەوەش ئاستی پاکانە و ڕەزابوونە بەو رادەی نیازی پێ بێ. ئەمەش هەمان پەیڤی سەهلی توستەرییە کە گوتوویە: «عیبادەت بە ژیان و ئاوەز و هێز جێبەجێ دەبێ: ئەگەر ترسی بێهێز کەوتنت نەبوو، خۆراک مەخۆ؛ چونکە نوێژێ لە سۆنگەی برسیەتیەوە بە دانیشتنەوە بخوێنرێ، هێژاترە لە نوێژێ کە بە تێری و بە پێوە بخوێنرێ. بەڵام ئەگەر ترسی ئەوە هەبوو کە ژینی یاخۆ ئاوەزی تێک بچێ، دەبێ بخوا، چونکە بی ئاوەز بەندەگی ناکرێ و پاراستنی گیانیش گرینگترە». لێیان پرسی: «خواردنت چۆن بووە؟» گوتی: «هەر ساڵ سێ درهەم خەرجم بووە. یەک درهەم ئاردی برێنجم کڕیوە، درهەمێ هەنگوین و درهەمێکیش ڕۆنم کڕیوە. هەموویانم پێکڕا تێکەڵ کردووەو سێسەد و شەست کولێرەم کردووەو هەموو شەوێ بە یەکێکیان ڕۆژووم کردۆتەوە». پرسیاریان لێکرد: «ئێستا چۆن دەخۆی؟» گوتی: «هەرچی دەس بدا».

**ئاستی دووهەم**: ئەوەیە کە بە نیو موود قنیات کا، ئەوەش بریتییە لە نانێک و سێیەکی هەر ئەو نانە کە چواریەکی مەنێکە و ئەم نیو موددەش دەبێتە سێیەکی زگ، هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «ثلث للطعامِ وَ ثلث للشَّرابِ وَ ثلث للذکر»[1]، یا بە گێڕانەوەیەکیتر «ثلث للنَّفسُ». ئەمە ئەوەیە کە پێغەمبەر فەرمووی: «چەن تیکەیەکم بۆ بەسە». ئەوەش کەمتر لە دە پاروەوە. عومەر پتر لە حەوت یان نۆ پارووی نەدەخوارد.

**ئاستی سێهەم** ئەوەیەکە بە موددێک قنیات کات و ئەوەش بەرانبەرە لەگەڵ سێ کولێرە. ئەمە لە سێیەکی گەدە زۆرترە و نزیک بە نیوەی دەکاتەوە.

**ئاستی چوارەم** ئەوەیەکە مەنێکی تەواو بخوا. ڕەنگە ئەوەی پتر لە مەنێ بێ، بگاتە ئاستی زێدڕۆیی و بە ئاوەژووی ئەم ئایەیەی قورئانە کە دەڵێ: «وَ لا تُسرِفُوا». بەڵام بە گوێرەی کات و هەیکەل و رادەی کارکردن دەگۆڕدرێ.

بە کورتی دەبێ کاتێ وازی لە خواردن هێنا، هێمان برسی بێ. هەندێ رادەیان بۆ خواردن دیاری نەکردووە، بەڵام هانیان داوە تا زۆر برسی نەبن، هیچ نەخۆن و هێشتا نەختێ برسیەتی مابێ، دەس ڕاگرن. نیشانەی برسیەتی ئەوەیە کە نانی بێپێخۆری پێ خۆش بێ و حەز بە خواردنی نانی جۆ و کارسن بکا. کە گەڕا بە دووی پێخۆردا، ئەوە تەواو برسی نییە. زۆربەی یارانی پێغەمبەر لە نیو موود تێنەپەڕاون. قاقمێ هەبوون کە حەوتەیەک ساعێکیان دەخوارد کە دەکاتە چوار موود. ئەگەر

---

[1] - واتە: سێیەکێ بۆ خۆراک، سێیەکێ بۆ ئاو و سێیەکێ بۆ زیکر.

خورمایان بخواردایە، دەیانکردە چوار موود و نیو بە بۆنەی ناوکەکەیەوە کە لێی کەم دەبووەوە.

ئەبووزەر گوتی: «لە سەردەمی پێغەمبەردا خواردنم لەم هەینیوە تا ئەم هەینی ساعێ جۆ بوو؛ بە خودا کە لەم ڕەوتەم پاشگەز نابم تا بە دیداری شاد دەبم». لۆمەی تاقمێکی کرد و پێی گوتن: «ئەنگۆ گۆڕاون». پێغەمبەر گوتبووی: «خۆشەویستترین کەستان لە لای من ئەوەیە کە بەو چەشنەی بمرێ کە ئەمڕۆ دەژی». بەم بۆنەوە ئەبووزەر پێی گوتبوون: «گۆڕاون، چونکە ئاردی جۆیان ئێلەک دەکرد و نانی ناسکیان دەکرد و پێخۆریان پێوە دەخوارد و جلکی ڕۆژ و جەلکی شەویان لێک جیا دەکردەوە؛ کەچی لە سەردەمی پێغەمبەردا وانەدەژیان. خواردنی خەلکی سوففە موودێ خورما بوو بۆ دوکەس، ناوکەکەشی لێ دەبووەوە».

سەهلی توستەری گوتی: «گەر خوێن سەرلەبەری ئەم جیهانە دابگرێ، خۆراکی بڕوادار لێی حەلالە». مەبەستی ئەوەیەکە بڕوادار بە قەدەر نیازی دەخوا، نە بەو چەشنەی ئەباحەتیەکان دەلێن کە هەرچی بگاتە دەستی بڕوادار هەرچەن حەرام بێ، دەبێتە حەلال؛ چونکە دەنکە خورمایەکی حەرام ئەگەر بە پەیغەمبەریش بدرایە، نەدەبووە حەلال.

**دووەم**. کاتی خواردنە. ئەمەش سێ ئاستە:

**بەرزترین ئاستی** ئەوەیە کە سێ ڕۆژ یان زۆرتر هیچ نەخوا، کەسی وا بووە کە بە حەوت ڕۆژ جارێ خواردوویە. دە دوازدە کەس لە تابعین هەبوون کە چل ڕۆژان هیچیان نەدەخوارد. ئیبراهیمی ئەدهەم و سەفیانی سووری هەردویان سێ ڕۆژ جارێ نانیان خواردووە. گوتوویانە هەرکەس چل ڕۆژان هیچ نەخوا، بێشک شتێ لە سەیروسەمەرەکانی مەلەکووتی لێ پێ پیشان دەدرێ. جارێ سۆفییەک بە تەریکە دونیایەکی مەسیحی گوت:

«بۆچی باوەڕ بە محەممەد ناهێنی؟» گوتی: «چونکە عیسا چل ڕۆژان هیچی نەدەخوارد، ئەمەش تەنیا لە پێغەمبەرێکی راسبێژ دەوەشتێتەوە، کەچی پێغەمبەری ئێوە وای نەکردووە». سۆفی گوتی: «من یەکێکم لە پێرەوانی موحەممەد، ئەگەر چل ڕۆژان دوورەپەرێز بم و هیچ نەخۆم، باوەڕدێنی». گوتی دێنم. سۆفی پەنجا ڕۆژ دانیشت. گوتی: «زۆرتری دەکەی؟» گوتی دەیکەم. شەست ڕۆژی تەواو هیچی نەخوارد. کابرای مەسیحی باوەڕی هێنا. ئەمەش ئاستێکی زۆر بەرزەو بەزۆر بۆی نەبراوەتە سەر و تەنیا ئەوەی بەندیواری ئەو دیوی ئەم جیهانە بێ بۆی دەکرێ.

**ئاستی دووهەم** ئەوەیە کە دوو یان سێ ڕۆژ هیچ نەخوا و لەم چەشنە زۆرە.

**ئاستی سێهەم** ئەوەیەکە هەر ڕۆژ جارێ بخوا؛ ئەمەش خوارترین رادەیە. کە بوو بە دوو جار زێدەڕۆییە و قەد برسی نابێ. پێغەمبەر ئەگەر بەیانان نانی بخواردایە، شەوان نەیدەخوارد، گەر شەوان بیخواردایە، بەیانی نەیدەخوارد و بە عایشە دەگوت: «ئاگادار بە زێدەڕۆیی نەکەی». دووجار خواردن

لە یەک ڕۆژدا زیادەڕۆییە. ئەگەر ویستی یەکجار بخوا، چاتر وایە پارشێو بخوا تابۆ شەونوێژ قورس نەبێ؛ ئەگەر زانی بیری خواردن وازی لێ ناهێنێ، پارشێو جارێک بخوا و بەربانگیش جارێکی‌تر.

**سێهەم** لە جۆری نانە کە چاترینی گەنمی دابێژراوە و خوارترینی جۆی دانەبێژراو و ناوەندی دەبێتە جۆی دابێژراو. چاترین پێخۆریش گۆشت و شیرینییە و کەمترینی سرکەو خوێیە و ناوەندیان دەبێتە چێشتی بێ ڕۆن. پێشوونان و ئەوانەی ڕێبواری ڕێی دوارۆژن، توخنی پێخۆر نەکەوتوون و ئەوەی نەفسیان حەزی لێ کردووە بە ئاوەژووی جوولاونەتەوە و گوتوویانە نەفس کە بە شاوەتەکەی گەیشت، تووشی مەستی و سستی و پەستی دەبێ و ژیانی دونیای پێخۆش دەبێ و ڕقی لە مردن هەڵدەستێ؛ بۆیە دەبێ دونیای لێ تەنگ و تاریک بکرێ تابۆی ببێتە زیندان و مردن دەرباز بوون لە زیندان بێ. لە خەبەردا هاتووە کە «شَرارُ اُمَّتِي الذينَ يَأكُلُونَ مُخَّ الحِنطَة»؛ واتە: خراپترینی نەتەوەی من ئەوانەن کە مەژگەی گەنم دەخۆن. ئەمە حەرام نییە و جار بە جار خواردنی ڕەوایە، بەلام ئەگەر بەردەوام لێی بخوا، ڕەنگە تەبعی فێری ڕابواردن بێ و تووشی مەستی و سستی بێ. دیسان فەرمووی: «خراپترینی نەتەوەی من ئەو کەسانەن کە پشتیان بە خواردنی دونیا ڕاستە و بیر و ویریان لە دووی خواردنی هەمەجۆر و جلکی هەمەڕەنگدایە و کەچی قسەی درێژ و زل دەکەن».

خودا بە مووسای گوت کە: «ئەی مووسا! چاک بزانە کە ژوانگەت قەبرە: دەبێ ئەم جەستەیەت لە زۆربەی شاوەتەکان بپارێزی». هەرکەس بۆی لواوە چاکی ڕابوێرێ و هەرچی ویستووە بۆی تەیار بووە، دانی خێریان پێدا نەناوە.

وەهبی مونەببێەدەڵێ: «لە ئاسمانی چوارەمدا دوو فریشتە پێک گەیشتن؛ یەکیان گوتی: "دەڕۆم تا ماسییەک بخەمە نێو تۆڕی فلان جوو، ئارەزووی ماسی کردووە". ئەویتر گوتی: "دەڕۆم تا کاسەڕۆنی فلان پارێزکار لێژ بەمەوە، چونکە ئارەزووی کردووەو بۆی ئابووراوە"».

پەرداخێ ئاوی ساردی بە هەنگوین شیرین کراویان هێنا بۆ عومەر، نەیخوارد و گوتی: «حسێبی ئەم پەرداخەم لێ دوور کەنەوە، زۆرترم پێ خۆشە».

ئیبنی‌عومەر نەخۆش بوو، نیازی بە ماسی سوورەوکراو بوو. نافیع دەڵێ: «لە مەدینەدا ماسی دەست‌نەدەکەوت، مەگین بە تەقالای زۆر. ماسییەکم بە یەک درهەم و نیو زیو کڕی و بۆم برد. دەرۆزەکەرێک هاتە بەر دەرگای، گوتی: "هەڵیگرەو بیدەرێ". گوتم: "ئەمە نیازی تۆیە، بە تەقالای زۆر دابینم کردووە. ئیزن بدە با بایی ئەم ماسییە پارەی پێ بدەم". گوتی: "نە، هەروا پیێ بدە". پێم داو دوابەدوای ڕۆیشتم و لێم کڕیەوە و هێنامەوە. گوتم: "پارەکەیم پێ داوە". گوتی: "بگەڕێوە و پیێ بدەرەوە و پارەکەشی مەهێنەوە. لە پێغەمبەرم بیست کە فەرمووی هەرکەس ئارەزوویەکی بێ، بیکرێ و لە بۆ خودا وازی لێ بێنێ و ببەخشێ، خوا هەڵەکانی دەسڕێتەوە"».

«عُتبة الغلام» هەویری لەبەر هەتاو رادەنا تا ویشک بێتەوە و بیخوا و چێژی لێ نەبا. ئاوی لەبەر هەتاو رادەنا تا گەرم دەبوو، ئینجا دەیخواردەوە.

مالکی دینار چل ساڵ تامازرۆی شیر بوو و نەیخواردەوە. یەکێک خورمایەکی تەڕی بۆ هێنا، لە نێو لەپیدا رایگرت، پاشان بە یارانی گوت: «ئەنگۆ بیخۆن، چل ساڵە لەمەم نەخواردووە».

ئەحمەد کوڕی ئەبیلحەواری موریدی ئەبووسلەیمانی دارانی بوو، گوتی: «ئەبووسلەیمان تامەزرۆی نانی گەرم بوو تا دەگەڵ خوێ بیخوا. بۆم هێنا. پارووێکی لێ کردەوەو دایناوە و گوتی: "پەروەرندەم! بۆچی دەتەوێ سزام بدەیتەوە ئارەزووەکەمت لە بەردەمم رانا؟ لە گوناحم پاشگەز دەبمەوە، لێم ببوورە"».

مالک کوڕی زەیغەم گوتی: «لە بازاڕی بەسرەدا بووم. کەوەرگێکی تازە و جوانم دی، ئارەزووی خواردنی لە دەروونمدا بزووتەوە؛ سوێندم خوارد کە نەیخۆم، چل ساڵە لەسەر ئەو بەڵێنەمم».

مالکی دینار گوتی: «پەنجا ساڵە دونیام تەلاق داوە، بە بۆنەی ئارەزووی شیر خواردنەوە. نەمخواردووە و نایخۆم تا ئەوەی بگەم بە پەروەرندەم».

حەمماد دەڵێ: «گەیشتمە بەر دەرکی حاتەمی تایی. دەنگیم بیست دەیگوت: جارێ داوای گێزەرت کرد، پێم دای، هێمان داوای خورما دەکەی؟ قەد نایخۆی. ڕۆیشتمە ژوورەوە، کەسم نەدی، تێگەیشتم لەگەڵ نەفسی خۆی دەدوێ».

«عُتبة الغلام» بە عەبدولواحیدی کوڕی زەیدی گوت: «فلان کەس دانستەیەکی دڵی خۆی باس دەکا کە من نیمە». گوتی: «چونکە ئەو نانی خاڵی دەخوا و تۆ نان و خورما». گوتی: «ئەگەر وازی لێ بێنم، دەگەمە ئەو ئاستە؟» گوتی: «دەگەی». گوتی: «کەواتە، وازم لێ هێنا» و دایە پڕمەی گریان. گوتیان: «بۆ خورما دەگری؟» عەبدولواحید گوتی: «نەفسی زۆری حەز لە خورمایە و ورەی پتەوی ئەمیش دەزانێ کە ئیدی قەد خورما ناخوا، بۆیە دەگری».

بووبەکری جەلاء گوتی: «من کەس دەناسم کە نەفسی ئارەزووی شتێ دەکا، دەڵێ "دە ڕۆژ هیچ ناخۆم، پاش ئەوە پێمی بدە". ئەمیش دەڵێ "نامەوێ دە ڕۆژان هیچ نەخۆی، دەست لەم ئارەزووەت هەڵبگرە"».

ئەمە ڕێگای ڕێبواران و گەورەکانە، ئەوەی نەگاتە ئەم رادە، خۆ هەر دەتوانێ واز لە هەندێ ئارەزووەکانی بێنێ و لە ماڵی خۆی بەخت کاو بەردەوام گۆشت نەخوا؛ چونکە عەلی گوتی: «ئەوەی چل ڕۆژ بەردەوام گۆشت بخوا، دڵی سەخت دەبێ و ئەوەش چل ڕۆژ هیچ گۆشت نەخوا، دڵی ناسک دەبێ». ناونجی ئەوەیە کە عومەر بە کوڕی خۆی راسپارد کە: «جارێ گۆشت بخۆ، جارێ شیر و

جاریّ سرکە و جاریّ نانی خاڵی».

جوانتر ئەوەیە کە بەسەر تێریدا نەخەویّ، چونکە دوو بیّ ئاگاییت پێکرا کۆوە کردووە. لە خەبەردا هاتووە کە «بپەرژێنە سەر نوێژ و واز لە خواردن بێنن و زۆر مەخەون تا دڵتان ڕەش نەبێتەوە». گوتوویانە دەبیّ پاش خواردن چوار ڕەکات نوێژ بکریّ و سەدجار زیکر بیێژریّ یاخۆ جوزئیّ قورئان بخوێنریّ تا زیانەکانی خواردن بڕەوێنێتەوە».

سەفیانی سوری کاتیّ تێری دەخوارد، شەو نەدەخەوت و دەیگوت: «کە چوار پێت تێر کرد، دەبیّ کاری سەختی لیّ بکێشیتەوە». یەکێک لە گەورەکان بە موریدەکانی دەگوت: «ئارەزوو مەکەن و مەیدۆزن، ئەگەر کردتان، مەکەونە دووی، ئەگەر کەوتنە دووی خۆشیتان نەویّ».

**شرۆڤەی ڕازی ئەم کۆشەوانە و جیاوازی نێوان ڕای پیر و مورید لەم چەمکەدا**

دەبیّ بزانی مەبەست لە برسیەتی کوێرکردن و هێنانە ژێر ڕکێفی نەفسە، تا ئەدەب بکریّ. کە گەیشتە ئەنجام، لەم توندییانە بیّ نیاز دەبیّ. لەم سۆنگەیە پیر، موریدەکەی بۆ ئەم کارانە ڕادەسپێری، کەچی خۆی نایکا؛ چونکە مەبەست، ڕەنج و برسیەتی نییە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە ئەوەندە نەخوا ورگی هەڵمسیّ. هەروەها برسیەتی تەنگی پیّ نەچنیّ، چونکە هەم ئەو تێرییە و هەم ئەم برسیەتییە دەیپەرژێننە سەر خۆ و لە عیبادەتی دەکەن. تەواوتربوونی مرۆڤ ئەوەیە بگاتە ئاستی فریشتەکان، ئەوانیش نە کەڵکەڵەی برسیەتیان هەیە و نە تێری؛ بەڵام مرۆڤ تەنیا بە تەنگ‌هەڵچنین بە نەفس دەگاتە ئەو ئاستە. تاقمیّ لە گەورەکان کە لە خۆیان دڕدۆنگ بوون، بەردەوام وشیار بوون و ئاگاداری خۆیان بوون. ئەوانەی کە تەواوتر بوون لەسەر هێڵی هاوسەنگیدا ڕاوەستاون. بەڵگەش ئەوەیە کە پێغەمبەر جاری وا بووە ئەوەندە ڕۆژووی گرتووە، وایانزانیوە قەد نایکاتەوە؛ جاری واش بووە ئەوەندە ڕۆژووی نەگرتووە وایانزانیوە قەد ڕۆژوو ناگریّ. لە ماڵدا کە داوای شتێکی دەکرد، ئەگەر بوایە دەیخوارد، گەرنەبوایە، دەیگوت بە ڕۆژووم. زۆریش حەزی لە هەنگوین و گۆشت بوو.

خواردنی خۆشیان بۆ مەعرووفی کەرخی ڕانا و خواردی، کەچی بێشری حافی نەیخوارد. لە مەعرووفیان پرسیار کرد، گوتی: «پارێزکاری بێشری برامی ڕاگرتووە، ناسین منی ئیزن داوە؛ من میوانم لە خانووی خانەخوێمدا، گەر پێم بدا دەخۆم و گەریش پێم نەدا، چاوەڕوان دەبم؛ من نە دەسەڵاتم پیّ ماوە و نە گلەییەک». لێرەدا جێگەی فریوخواردنی گێلۆکان هەیە کە توانی بەرگری لە نەفسیان نییە دەڵێن: «من خواناسم، وەکی مەعرووفی کەرخی». کەواتە بێجگە لە دوو کەس، کەسی دی واز لە کۆشەوە ناهێنیّ: یان ڕاسبێژێکی چاکەکار، کە لەسەر هێڵی ڕاست ڕاوەستابیّ؛ یاخۆ گێلە پیاویّ کە پیێ وابیّ لەسەر هێڵی ڕاست ڕاستاوە. مەعرووفی کەرخی دەستەڵاتی پیّ

نەمابوو، چونکە ئەگەر خراپەیەکیان دەگەڵ کردایە -بە دەست و زمان- قەد تووڕە نەدەبوو، چونکە بە کاری خوای دەزانی. ئەو پەیڤە بۆ کەسێکی وەک ئەو ڕاستە. جا ئەگەر کەسانێکی وەکوو بێشری حافی و سڕی سەقەتی و مالکی دینار و وەک ئەمانە، لە خۆیان ئارخەیان نەبووبێتن و ڕێبازی کۆشەوەیان بەرنەدابێ، بۆی نالوێ کەسێک لەم ڕۆژگارەدا لە خۆیدا وا ببینێ.

## شرۆڤەی زیانەکانی واز هێنان لە ئارەزووەکانی نەفس

ئەم کارە دوو زیانی هەیە: یەکەم ئەوەی کە بەرەنگاری هەندێ ئارەزووی پێ ناکرێ و پێشی خۆش نییە خەڵک بیزانن:

لە تەنیایی خۆیدا بیخوا و لە لای خەڵکی نەخوا؛ ئەمەش هەمان دوڕووییە. هەروەها ڕەنگە شەیتان فریوی بدا و پێی بڵێ: «ئەمە بۆ چاکەی خەڵکە تا چاوت لێ ببڕن و بکەونە دووت». ئەمەش بێجگە لە هەڵخەڵەتان چیدی نییە. کەسی واش هەیە، ئەو شتەی کە بۆ خۆی حەزی لێ کردووە، دەکڕێ و دەیباتەوە ماڵ تا خەڵک بیبینن، کەچی لێی ناخوا و بە پەنامەکی دەیداتە سەدەقە؛ ئەمە ئەو پەڕی ڕاستییە و کاری ڕاسبێژانە. ئەمە بۆ نەفس گەلێک گرانە؛ مەرجی دلبێشی[1] ئەوەیە کە ئەم کارەی پێ گران نەبێ: گەر پێی گران بوو، هەنووکە دڵی گیرۆدەی دوڕازی شراوەیە؛ بەندایەتی دوڕازی بەجێ دێنێ، نەک پەروەردگار؛ ئەوەش لە ئارەزووی خواردن هەڵبێ و بکەوێتە داوی دوڕوویی، وەکوو ئەو کەسەیە لەبەر باران هەڵبێ و لە ژێر پلووسک دابنیشێ. کەواتە، دەبێ کاتێ نەفس ئەم داخوازەی لێکرد، لە لای خەڵکی لەو ئارەزووەی نەختێ بخوا -زۆر نەخوا- تا هەم دوڕازی بشکێ و هەم نەفسی کوێر بکاتەوە.

## شاوەتی ژێر سک

### شرۆڤەی شاوەتی ژێر سک

بزانە ئارەزووی جووتبوونیان بۆیە بەسەر مرۆڤدا زاڵ کردووە تا ببێتە هۆی بەردەوامی تۆرەمەی مرۆڤ و نەبڕانەوەی بەرەی ئینسان و هەروەها نوێنەرێ بێ لە چێژی بەهەشت. زیانی ئەم ئارەزووە گەلێک زۆرە. شەیتان بە مووسای گوت: «دەگەڵ هیچ ئافرەتێ بە تاقی تەنێ دامەنیشە، هیچ ژن و پیاوێ بە تەنیا پێکەوە نەبوون، مەگین ئەوەی من بوومە یاریان تا دنەیان دەم و تووشی گوناحیان کەم».

---

[1] - دلبێشی: اخلاص.

سەعیدی موسەیێب دەڵێ: «پەروەردگار هیچ کەسی نەکردە پەیغەمبەر تا ئەوەی شەیتان لێی ناهمێ بوو؛ من لە هیچ شت بە قەدەر ژنان لە خۆم دڕدۆنگ نیم، بۆیە بێجگە لە ماڵی خۆم و کچم نارۆمە ماڵی هیچ ژنێ».

بزانە، لەم ئارەزووەشدا هەم زێدڕۆیی هەیە، هەم کەمڕۆیی و هەم ناونجی. زیادەڕۆیی ئەوەیە کە لە هیچ کارێکی کرێت شەرمی نەبێ و هەموو ژیانی بۆ بدۆڕێنێ. کەوابوو دەبێ بە ڕۆژوو گرتن بیشکێنێ، گەر پێێ نەکرا دەبێ ژن بێنێ. زێدەڕۆییش ئەوەیە کە ئەم ئارەزووەی بە تەواوی بسڕێتەوە؛ ئەمەش نوقسانییە. ناونجیش ئەوەیە کە شاوەت بێ، بەڵام ژێرەدەست بێ. کەسی وا هەیە دەرمان دەخوا تا شاوەتی زۆرتر بێ و هۆکەشی نەزانیەو وەکوو ئەو کەسەیە کە هێلانەی ژەنگەسوورە بخرووشێنێ تا پێیەوە بدەن و بیگەزن. مەگەر بۆ کەسانێک کە ژنیان هەیە و بۆ ڕاگرتنی مافی ژنیان وا دەکەن، چونکە قەڵای ژنان، پیاوانن.

لە خەبەردا هاتووە کە پێغەمبەر فەرمووی: «لە خۆمدا کزی شاوەتم بینی، جوبرەئیل حەلیمی بۆ نواندم». هۆکەشی ئەوەیە کە پەیغەمبەر نۆ ژنی بوو و ئەم نۆ ژنە لە هەموو پیاوی جیهان حەرام کرابوون و هیوایان لە هەموو کەسێ بڕابوو.

یەکێک‌تر لە زیانەکانی شاوەت، ئەوینە کە سەرچاوەی زۆربەی گوناحانە. ئەگەر مرۆڤ لە سەرەتاوە ئاگای لە خۆی نەبێ، هەوساری لە دەست دەردەچێ. ئاگاداربوون و خۆ پاراستن، ڕاگرتنی چاوە. گەر لە پڕونەکاو چاو بە کەسێ بکەوێ، پاراستن و ڕاگرتنی ئاسانە؛ کەچی ئەگەر گوێی پێ نەدا، دواجار ڕاگرتنی زۆر دژوارە. نەفس وەکوو ئەسپێکە کە ئەگەر ویستی بڕواتە شوێنێ، سەرەتا بە توندکردنی هەوساری بە سانایی دەگێڕدرێتەوە، بەڵام کە هەوساری شل بوو و چوو، ئیدی گرتنی دووی و کێشانەوەی کارێکی زۆر ئەستەمە. کەواتە، ڕاگرتنی چاو زۆر گرینگترە.

سەعیدی جوبەیر دەڵێ: «ئاژاوەی داوود لە سۆنگەی چاوەوە بوو». داوود بە کوڕی خۆی گوت: «ڕەوایە بکەویتە دووی شێر و ئەژدیها، بەڵام ڕەوا نییە بکەویتە دووی ئافرەتان».

لە یەحیای کوڕی زەکەریایان پرسی «سەرەتا زینا لە کوێوە تووش دەبێ؟» گوتی: «لە چاو و لە شاوەتەوە».

پەیغەمبەر فەرمووی: «وردبوونەوە لە ژناندا تیرێکی ژاراوییە لە تیرەکانی شەیتان: ئەوەی لە ترسی خوداوە چاوی لە هەمبەر ئافرەتان داخا، خودا بڕوایەکی دەداتێ کە شیرینیەکەی لە دڵی خۆیدا ببینێتەوە». پێغەمبەر فەرمووی: «پاش کۆچی دواییم هیچ ئاژاوەیەک وەکوو ژنان تووشی نەتەوەکەم نابێ». دیسان گوتی: «چاویش وەکوو شەرمگا تووشی زینا دەبێ، زینای چاو ڕوانینە».

کەواتە، ئەوەی چاوی پێ ڕانەگیرێ، دەبێ شاوەتی لە ژێر ڕکێف بگرێ، دەرمانی ئەم ئارەزووەش

ڕۆژووە، گەر پێی نەکرا، ژن هێنان یان شووکردنە.

ئەگەر پێی ناکرێ چاو لە هەمبەر منداڵانی ساف و لووس داخا، زیانی ئەمە گەلێک زۆرترە؛ چونکە ئەمە قەد بۆی ڕەوا نابێ. ئەگەر سەیرکردنی کوڕیژگەیەکی سافولووس چێژێ بگەینێ، ئەو سەیرکردنە حەرامە؛ مەگەر ئەوەی ئەو خۆشییە وەکوو خۆشی سەیرکردنی گوڵ و گوڵزار و نەخش و وێنەی جوان و شینایی دەشت بێ، ئەمە زیانی نییە. نیشانەکەشی ئەوەیە کە حەز بە تێکەڵبوون لەگەڵی نەکا؛ چونکە گوڵ و گوڵزار هەرچەند زۆر جوانن، بەڵام کەس پاپای ئەوەی ناکەوێتە دڵ کە ڕایانمووسێ یا دەستیان پێدا بهەنوێ. کە ئەم داخوازەی بۆ هاتەدی، ئەمە نیشانەی شاوەتەو یەکەم هەنگاوی لووسکەبازییە.

یەکێک لە پیرەکان دەڵێ: «بۆ موریدەکانم، ئەوەندە لە کۆیلەیەکی لووسکە دەترسم، لە شێرێکی تووڕە کە هێرشی بۆ هێنابێ، ناترسم».

موریدێ گوتی: شاوەتم بە سەردا زاڵ بوو، خوستی بڕیم؛ گازە و دوعای زۆرم کرد، زۆریش گریام. لە خەونمدا یەکێک پێی گوتم: «چ رووی داوە؟» بارودۆخی خۆم بۆی گێڕاوە. دەستی بەسەر سنگم هەنوو، کە لە خەو ڕابووم، چاک بوومەوە. پاش ئەوە یەک ساڵ ڕابورد، دیسان ڕۆیشتمەوە هەمان دۆخ. دیسان زۆر گریام. هەر ئەو کابرایەم بە خەو دیتەوە. گوتی: «دەتەوێ لە کۆڵت کەوێ؟» گوتم: دەمەوێ. گوتی: «ملت ڕاکێشە». بۆم ڕاکێشا. شیرێکی هەڵێنا و بەسەر ملمدا دای. کە لە خەو هەستام، لە کۆڵم کەوتبوو. پاش یەک ساڵیتر، دیسان بۆم هاتەوە. دیسان گریام، لە لای پەروەردگار زۆر پاڕامەوە، تا ئەو کابرایە دیسان هاتەوە، پیێ گوتم: «تا کەنگێ دەتەوێ لە پەروەرندەت داوای لابردنی شتێک کەی، کە پیێ خۆش نییە بەری بگری»؛ لە خەوڕابووم، بێ سێ و دوو ژنم هێنا، لە کۆڵم کەوت و دەرباز بووم.

## شرۆڤەی پاداشی ئەو کەسەی بە پێچەوانەی شاوەتی بجوێتەوە

بزانە، هەر چەن شاوەت زۆردارتر بێ، پاداشی دژایەتی لەگەڵی زۆرترە. هیچ شاوەتێ لەمە زاڵتر نییە، بەڵام داخوازی ئەم شاوەتە لە هەموویان دزیوترە؛ زۆربەی ئەوانەی ناکەونە دووی ئەم ئارەزووەیان، یان لە ناتوانییە یاخۆ شەرم، یا ترس لە ئاشکرا بوون و ناوزڕان. ئەوەی لەم سۆنگەوە لە شاوەت خۆبپارێزێ، هیچ پاداشێکی بۆ نییە، چونکە مەبەستی فەرمانبەرداری دونیایە نەک خوا. بەڵام بێهێزی لە نەکردنی گوناح، خۆی بەختەوەرییە؛ چونکە بە هەر هۆیەک کە خۆی لێ بپارێزێ، تووشی گوناح و تاوان نابێ؛ بەڵام ئەوەی بۆی بووز بخوا ئەم گوناحە کاو تەنیا لەبەر خوا دووری لێ بگرێ و خۆی بپارێزێ، پاداشی زۆروزەوەندەیەو لەو حەوت کەسەیە کە لە ڕۆژی پەسڵاندا لە ژێر

سای عەرشی خوادادان. ئاستی ئەم وەکوو یووسفی پێغەمبەرە لەم بابەتەدا. پێشەواو ڕێبەری لە بواردنی ئەم ڕێگا هەڵەتەدا یووسف بووە.

سلەیمانی یەسار گەلێک جوان و خوشیک بوو. ژنێ خۆی بۆ ڕانا؛ لە لای هەلات. گوتی: «یووسفم بە خەو دی، گوتم: "تۆ یووسفی؟" گوتی: "ئەرێ، من ئەو یووسفەم کە تەمام کرد و تۆش ئەو سلەیمانەی کە تەمات نەکرد"؛ ئاماژەیە بەم ئایەتە: «وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا»[1].

هەر ئەم سلەیمانە دەگێڕێتەوە کە: «بۆ حەج دەڕۆیشتم، کە لە مەدینە هاتمەدەر لە مەنزڵگایەکدا -کە پێێ دەڵێن ئەبوا- دابەزاین. هەڤاڵەکەم ڕۆیشت تا خواردن بکڕێ. ژنێکی عارەبی روو وەک مانگ لە دوورەوە هات و پێی گوتم: "تێرم دەکەی؟" پێم وابوو نانی دەوێ، سفرەی نانەکەم بۆ کۆ کردەوە. گوتی: "ئەوەم مەبەستە کە ژنان لە پیاوانیان دەوێ". سەرم کردە نێو باخەڵمدا و بە کوڵ گریام؛ ئەوەندە گریام کە ژنەکە وازی هێناو بەجێێ هێشتم. هاوڕێکەم گەڕایەوە، ئاسەواری گریانەکەی بەسەر ڕوومەتمدا بینی. گوتی چ بوو؟ گوتم: "تاسەی ژن و منداڵم کردووە و بۆیان گریام". گوتی: "ڕاستم پێ بڵێ، ئێستا کە ڕۆیشتم وانەبووی، لەم ماوەدا چ قەوماوە؟" زۆری پێداگرت، ناچار بۆم گێڕایەوە. ئەویش بوو بە گریانەوە. پێم گوت تۆ بۆچی دەگری؟ گوتی: "لەوەی دەترسم ئەگەر من بوایەم، خۆم پێ ڕانەدەگیرا". کە گەیینە فەککە و سەعی و تەوافمان بەجێهێنا، لە هۆدەیەکدا خەو بردمیەوە. لە خەونمدا پیاوێکی بالابەرزی ڕووگەشی شووشەییم بینی، گوتم تۆ کێیت؟ گوتی: "یووسفم". گوتم: "یووسفی ڕاسبێژ؟". گوتی: "ئەری". گوتم: "چەندە سەیرە ئەو چیرۆکەی تۆ لەگەڵ ژنی گەورەی میسردا!" گوتی: "بەسەرهاتی تۆ لەگەڵ ئەو ژنە عارەبە سەیرترە"».

ئیبنی عومەر گوتی پەیغەمبەر بۆمانی گێڕایەوە کە: «لە ڕۆژگارانی ڕابردوو، سێ زەلام پێکڕا بۆ سەفەر ڕۆیشتن. شەویان بە سەردا هات، بۆ حەسانەوە ڕۆیشتنە نێو ئەشکەفتێ. گابەردێ لە کێو بەربۆوە و دەرگای ئەشکەوتی ئاخنی. هەرچی هانیان دا بۆیان لانەبرا. یەکیان گوتی: تەنیا ڕێێ دەربازبوونمان ئەوەیە هەرکەس لە بۆ خودا کارێکی کردووە، بیگێڕێتەوە، بەڵکوو ئەم گابەردە لە سەرجێێ خۆی نەمێنێ و ڕزگارمان بێ. یەکیان گوتی، دایک و باوکێکی پیرم بوو، قەد بەر لەوان نە خۆم نانم دەخوارد نەژن و منداڵم. ڕۆژێ کارێکم بۆ هاتە گۆڕێ، تا درەنگان خەریکی کار بووم، کە گەڕامەوە دایک و بابم نووستبوون. شیرم هێنابوو پێکڕا بیخۆن، دەفری شیرم لە نێو دەستدا بوو، لە پێش دەرگا ڕاوەستام تا بە خەربەر بنەوە و بیخۆن، منداڵەکانم برسی بوون، دەگریان و داوای شیریان دەکرد، گوتم دەبێ سەرەتا دایک و بابم بخۆن. تا بەیانی هەڵنەستان، بەیانی کە هەستان،

---

١ ـ قورئان (٢٤/١٢). ئەو ژنە پەلاماری ئەمی داو یووسفیش تەمای ئەو ژنەی کرد.

من هەروا بەرزەپا ڕاوەستا بووم، بۆیانم دانا و خواردیان. پەروەرندەم ئەگەر تەنیا لەبەر ڕەزای تۆ بوو، لەم ئەشکەوتەمان ڕزگارکە. بەردەکە لە جێی خۆی بزووت و نەختێ چووە لاوە و ڕووناکی دەر هاتە ناو، بەڵام ئەوەندە نەبوو بچنە دەر. ئەویتریان گوتی: پەروەرندەم! خۆت دەزانی، دۆتـامێکم بوو، زۆرم حەز پێ دەکرد. بۆم پێک نەدەهات و گوێی پێ نەدەدام، تا ئەوەی قات و قڕی داهات. زۆریان تەنگ بوو، لەگەڵم ڕاهات. پێم گوت ئەگەر لەگەڵم پێک بی، سەدوبیست دینارت دەدەمێ. گوتی باشە. بڕیارمان دا، هاتە ژوان، ویستم بڕۆمە لای پێی گوتم ناترسی لە خوا بە بێ ئیزنی، ئەو مۆرەی داینــاوە هەڵیگری؟ زۆر ترسام، زێڕەکەم دانا و پاشگەز بوومەوە، هەر چەن هیچ شتێکیتر لە جیهاندا وەکوو ئەو لە لام بەدەو نەبوو؛ پەروەرندەم! ئەگەر ئەم کارەم بۆ تۆ کرد، لەم ئەشکەوتەمان دەرباز کە. بەردەکە نەختێتر بزووتەوە و لەسەر جێێ لاچوو، بەڵام هێشتا وانەبوو بڕۆنە دەرەوە. پیاوی سێهەم گوتی: پەروەرندەم! خۆت دەزانی کە جارێ کرێکارم بوو. کرێی هەموویانم دا بێجگە لە یەکێکیان کە نەهاتەوە. مزی کابرام دا بە مەڕێک و بۆم بەخێو کرد. بە ناوی ئەوەوە مامەڵەم پێ کرد تا زۆروزەوەند بوو. ڕۆژێ کابرا هاتەوە و داوای مزەکەی کرد. دەشتێ پڕ لە گاو مەڕو بزن و حوشترم پێ پیشان دا، گوتم ئەوە کرێکەتە. گوتی: قەشمەریم پێ دەکەی؟ گوتم نە و هەمووم بۆ گێڕایەوە و پێم دا و هیچم لێ گل نەداوە. پەروەرندەم! ئەگەر دەزانی لەبەر تۆ بوو، ڕزگارمان کە. پاش ئەوە بەردەکە لەبەر دەرکی ئەشکەفتە لاچوو و دەرباز بوون».

بەکر کوڕی عەبدوڵلای مەزنی دەگێڕێتەوە کە «پیاوێکی قەساب، گراوی کارەکەرێکی جیرانیان بوو. ڕۆژێ کچەیان ڕەدووی کارێکدا بو گوندێکیتر نارد. قەساب کەوتە دووی، لە نێوانی ڕێدا تووشی هات و لەبەژنی ئاڵا. کچە گوتی: ئەی مێرخاس! من پتر لە تۆ بۆ تۆ بە کوڵم، بەڵان لە پەروەرندەم دەترسم. کابرا گوتی: تۆ کە دەترسی، بۆچ من نەترسم. لە کردەی خۆ پەژیوان بوو گەڕایەوە. لە ڕێدا تینوێتی تەنگی پێهەڵچنی و کەوتە شەرارەی مەرگەوە. پیاوێ کە بە نوێنەرایەتی پێغەمبەری ڕۆژگار بۆ شوێنێ دەچوو، تووشی هات. گوتی: چ بووە؟ گوتی: تینووم. گوتی: وەرە با پێکڕا لە خوا داوا کەین هەورێکمان بۆ بنێرێ و لەسای ئەو هەورە ڕێگا ببڕین. قەساب گوتی: من هیچ فەرمانبەرداری خوام نەکردووە، تۆ گازە بکە و من دەڵیم ئامین. وایان کرد. هەورێک هاتە سەر سەریان و لە سایدا ڕێیان بڕی. کە لێکدابڕان، هەورەکە دەگەڵ قەساب ڕۆیشت و نوێنەری پێغەمبەر کەوتە بەر هەتاو. گوتی: ئەی مێرخاس! گوتت هیچم چاکە نەبووە، کەچی ئەم هەورە بۆ تۆ ناردرابوو، باسی خۆتم پێ بڵێ. قەساب گوتی: هیچ لە خۆمدا شک نابەم. بێجگە لەوەی کە بە قسەی ئەو کچە کارەکەرە لە کردەی خۆم پاشگەز بوومەوە. کابرا گوتی: هەروایە کەس بە قەدەر پاشگەز بوو لە گوناح لە لای پەروەرندەی هێژا نییە».

## شرۆڤەی زیانی سەیرکردنی ژنان و هۆی حەرام بوونی

دەبێ بزانی زۆر دەگمەنە پیاوێک سەیری ئافرەتان کاو خۆی پێ ڕاگیرێ. کەواتە، چاتر وایە چاری کار لە سەرەتاوە بکرێ و سەرەتاش ڕوانینە.

عەلای کوڕی زیاد دەڵێ: «سەیری چارشێوی هیچ ژنێ مەکەن، چونکە ئارەزووتان لە دڵ دەبزوێتەوە». بە ڕاستی کە سەیر نەکردنی جلوبەرگی ئافرەتان و نەبیستنی بۆن و بەرامەی خۆشیان و گوێ نەگرتن لە دەنگیان فەرز و پێویستە و ئەگەر هەواڵێکیان پێدەدەی، دەبێ لە شوێنێکدا ڕاوەستی کە ئەوان بتبینن و گوێیان لە دەنگ بێ، هەرچەن تۆ ئەوانت پێوە دیار نەبێ؛ چونکە لە هەرکوێدا جوانی هەبێ، تووی شاوەت و ئارەزوو دەچێنرێتە نێو دڵ.

ژنیش دەبێ لە پیاوی جوانخاس خۆی بپارێزێ. هەر ڕوانینێک کە ئارەزووی دەگەڵ بێ، حەرامە و هەر ڕوانینێکی ئارەزوومەندانە -هەرچەند جلوبەرگی لەبەردا بێ- دیسان حەرامە. بەڵام ئەگەر لەپڕونەکاو چاوی پێ بکەوێ، حەرام نییە، بەڵام ڕوانینی دووەم کە تەمای لەگەڵە، حەرامە.

پەیغەمبەر فەرمووی: «یەکەم ڕوانین هی خۆتە و دووەم ڕوانین گوناحە». دیسان فەرمووی: «ئەوەی ئەڤیندار بێ و خۆی ڕاگرێ و بیشارێتەوە و لەو دەرد و ڕەنجە بمرێ، شەهید بووە». خۆڕاگرتن ئەوەیە کە سەرەتا سەیرکردنێکی کتوپڕ ڕوویدابێ؛ بۆ جاری دووەم چاوی داخاو ئیدی سەیر نەکا و گراوییەکەی لە دڵ بشارێتەوە.

ئەوەبزانە کە هیچ خراپەیەک وەکوو بێ پەردە دانشتنی ژنان و پیاوان لە کۆڕ و میوانیدا نییە؛ هەروەها بە تەنیا لەبەرکردنی چارشێو و بەستنی ڕووبەند بۆ ئافرەتان بەس نییە؛ چونکە ئەوەی چارشێوی سپی بە سەردا دەدا و لە ژێر ڕووبەنددا خۆ دەنوێنێ، خۆی شاوەت دەبزوێنێ؛ تەنانەت ڕەنگە لەوەی کە ڕووبەندی نییە، گەلێک خۆی جوانتر بنوێنێ، کەواتە، لەسەر ژنان حەرامە کە چارشێوی سپی بە سەردا بدەن و ڕووبەندی جوان و ڕازاوە لە ڕوو بنێن و بێنە دەرەوە. هەر ژنێ وایکرد، گوناحبارە؛ مێرد و خزمانی کە پێی ڕازی بن و بەرگری لێ نەکەن، لەو گوناحەیدا هاوبەشن.

هەر ئارەزوو و بیرێکی خراپ کە بە دڵی پیاواندا بێ و هەر خراپکارییەک کە ڕووبدا، گوناحی لە ئەستۆی ئەو کەسانەیە کە ئەم کارە دەسەلمێنن.

ڕەوا نییە هیچ پیاوێ بە نیازی شاوەت بەرگی ژنان بکاتە بەر یاخۆ دەست بەسەر بەرگی ژناندا بساوێ یا بۆنیان کات؛ نابێ ڕەشەرەیحانە و سێو و ئەو شتانەی بۆ دەربڕینی خۆشەویستین، بداتە ژنێ یان لێی بستێنێ، یاخۆ قسەی خۆش و ناسکی پێ بڵێ. ژنیش نابێ لەگەڵ پیاوی لاپرە و بیانی بە دەنگی نەرم و ناسک بپەیڤێ، بەڵکوو دەبێ بە شەرم و حەیاوە دەگەڵ پیاوان بدوێ. هەروەک

خوداش فەرمووی: إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا[1]؛ بە ژنانی پێغەمبەر دەڵێ کە بە خاوی مەپەیڤن و دەگەڵ پیاوانی بیانی قسە مەکەن؛ هەروەها نابێ لە جامێ کە ئافرەتێ ئاوی خواردۆتەوە، بە نیازی دەم نانەجێی دەمی ئەو ئافرەتە، ئاو بخۆنەوە.

هۆزانێ گوتی، خێزانی ئەبوو ئەیووبی ئەنساری و منداڵەکانی، هەر دەفرێکیان کە لە بەر دەمی پێغەمبەر هەڵدەگرت و دەست و دەمی پێغەمبەر بەو دەفرە گەیشتبوو، ئەمانیش بۆ ودم و مبارەکی دەستیان پێدا دەساوی. ئەم کارە گەر نیازی خراپی تێدا نەبێ، پاداشی زۆری هەیە. دووری لە هیچ شت بە قەدەر دووری لەو شتانەی بە ژنانەوە بەندیوارە، گرینگ نییە.

بزانە کاتێ ژن یاخۆ منداڵێ بە ڕێگایەکدا تێدەپەڕێ، شەیتان داوا دەکا کە «وردی‌بەوە، بزانە چۆنە». دەبێ بە شەیتان بڵێی: «بۆچی سەیری کەم؟ ئەگەر دزیو بێ، بێزم لێ دێ و گوناحبار دەبم، ئەگەریش خوشیک بێ، چون حەلالی من نییە گوناحبار دەبم و هەناسەسارد دەمێنمەوە و گەریش ڕەدووی کەوم دین و دونیامی بۆ دەدۆڕێنم و ڕەنگە نسک و ناهمێ بگەڕێمەوە».

ڕۆژێک پێغەمبەر لەرێدا دەڕۆیشت، ژنێکی بینی؛ بە خێرایی گەڕایەوەو هاتەوە ماڵ بۆ لای خێزانی و پاشان لەش پیسی دەرکرد و دیسان هاتە دەرەوە و گوتی: «کاتێ ژنێکتان بینی کە بە نازو شاوەتەوە ڕێی دەبڕی، بگەڕێنە ماڵ و لە لای خێزانتان بحەسێنەوە. ئەو چێژەی لە خێزانتان دەیبەن، لە ژنی بیانیش هەر ئەوەدەبەن».

---

[1] ـ قورئان (٣٢/٣٣) ئەگەر خۆتان ئەپارێزن زۆر بە خاوی قسە مەکەن؛ نەوەک کەسێ غەرەزێکی لە دڵدا بێ، قرمی خۆش کا؛ هەر چۆن پەسندە بپەیڤن. (هـ).

## بنەمای سێیەم - هەڵپەی ئاخاوتن و مێڵی زمان

بەڕاستی کە زمان یەکێک لە ئافرێندراوە سەیرەکانی پەروەردگارە، کە لە بیچمی پاروەوە گۆشتێکدایەو کەچی هەرچی لە بووندایە دێتە ژێر ڕکێفی و تەنانەت ئەو شتانەش کە لە نەبوون (عدم) دان دێنە بەر کاردی شرۆڤەکردنی و هەم لە بوون چێژ وەردەگری و هەمیش لە نەبوون. زمان بریکاری ئاوەزەو هیچ شتێ لە دەرەوەی دەسەلاتی ئاوەز نییە و ئەوەی بە ئاوەز و خەیاڵ و دالغەدا تێپەڕا، زمان لێی دەدوێ و باسی لێ دەکا و پەیڤی پێ دەڕازێنێتەوە؛ کەچی ئەندامانی‌تر وانین؛ چاو بێجگە لە ڕەنگ و بیچم نانانسێ، گوێ بێجگە لە دەنگ ناناسێ و ئەندامای‌تریش هەروان؛ دەسەلاتی هەر ئەندامێ بەسەر بەشێ لەم ولاتی لەشدایە، کەچی زمان دەسەلاتی لە هەموو بەشێکدا هەیە، وەکوو دەسەلاتی دڵ. زار لەسەر ڕێی دڵدایە و هەرچی وێنە لە دڵدابێ، زار دەیکاتە پەیڤ و هەرچیش پەیڤ بێ، دەکرێتە وێنە و دەدرێتە دڵ؛ وەکوو: ئەگەر گریان و لاواندنەوە، بێتە سەرزار و وشەکانی بێنە گوتن، دڵیش ناسک و خەمبار دەبێ و ئاوری تێبەردەبێ و هەڵمی ئەو ئاورە بەرەو مێشک دەکەوێتە ڕێ و بە چەشنی ڕۆندک لە چاو دێتەدەر؛ هەروەها ئەگەر وشەی جوان و پەسنی جوانان بێتە سەرزار، دڵ پێی دەگەشێتەوەو شاوەت دەبزوێتەوە. هەروەها هەر پەیڤێک کە بێتە سەر زار، دانستەی ئەو پەیڤە لە دڵدا دێتە دی؛ بۆیە ئەگەر پەیڤی کرێت بڵێ، دڵ تاریک دەبێ و ئەگەر پەیڤی ڕاست بڵێ، دڵ ڕووناک دەبێ و گەر قسەی درۆ بێژێ، دڵیش چەوت دەبێ و هیچ شتێ بەڕاست نابینێ، وەکوو ئاوێنەی چەوتی لێ دێ. لەم سۆنگەوە خەونی شاعیر و درۆزن کەمتر ڕاستە؛ چونکە دەروونی بە بۆنەی پەیڤی درۆوە چەفت و لار بووە؛ ئەوەش خووی بە ڕاستیەوە گرتبێ و بێجگە ڕاست نەڵێ، خەونەکەی ڕاست و دروست دەردێ.

هەروەها هەرکەس خەونی ڕاست نەبێ، کاتی سەفەری ئەو دونیای بۆ هاتە گۆڕێ، سیمای پەروەرندەی -کە دیتنی ئەو پەڕی هەموو خۆشییەکانە- ڕاست نابینێ و چەوت پێی پیشان دەدرێ و لەو خۆشییە بێبەش دەبێ؛ هەروەها هەروەکوو چۆن ڕوومەتی جوان لە نێو ئاوێنەی چەوتدا دزێو دەنوێنێ، یاخۆ لە نێو لێواری شمشێردا بە درێژایێ یا بە پانا دیارە، نە تەنیا جوان نییە، بەڵکوو زۆریش

كرێت دەنوێنێ، كارەكانی ئەو دونیا و راستەقینەی كارەكانی پەروەردگاریش هەروایە. كەواتە راستی و چەوتی دڵ، پاشەرۆكی راستی و چەوتی زمانە. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «بڕوا راست و دروست نابێ، تا دڵ راست نەبێ؛ دڵیش راست نابێ تا زمان راست نەبێ».

كەواتە دووری لە مێمل[1] و زیانی زمان لە كارە گرینگەكانی دینە. ئێمەش لەم پاژەدا هێژایی بێ-دەنگی باس دەكەین؛ پاشان ئاپوری زۆرگوتن و هەرزەبێژی و شەڕەقسە و گەپچاڕ و گاڵتە و جەفەنگ‌كردن و زیانی درۆ و خوسپە و دووزمانی و دوڕازی و زیانەكانی پێداهەڵگوتن و فڕ پێ دادان و نەوەی بەمانەوە بەندیوارە، بە وردی راڤە دەكەین و دەرمانی چارەسەر كردنیشی دەنوێنین. «إن شاءَ الله - عَزّوجَلّ».

## شرۆڤەی چاكەی بێدەنگی

چۆنكە مێملی زمان زۆرە و خۆ لێ پاراستنی دژوارە، هیچ دەرمانێ چاتر لە بێدەنگی نییە؛ گەر پێێ بكرێ. كەواتە مرۆڤ تا پێویست نەبێ، نابێ بپەیڤێ. دەڵێن عەوداڵ ئەوەیەكە تا پێویست نەبێ، نە بخەوێ و نەبخوا و نەبێتە قسە. پەروەردگار فەرموویە: لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ[2]؛ واتە: لە پەیڤیندا هیچ خێرێ نییە، مەگین فەرمان دان بۆ خێرات و گوتن بە چاكە و پێكـهێنانی كاری رەوای نێوان خەڵكی.

پێغەمبەر فەرمووی: «مَن صَمَتَ نجا»؛ ئەوەی بێ‌دەنگ بوو، خەلست. دیسان فەرمووی: «ئەوەی لە ئاوری زگ و ژێر سک و زمان پارێزرا، پارێزراوێكی تەواوە».

مەعازی جەبەل لە پێغەمبەری پرسی: «ئەی پەیغەمبەر! چ كردەیەک هێژاترە؟» پێغەمبەر زاری دەرهێناو قامكی لەسەر دانا؛ واتە: بێدەنگی.

عومەر دەڵێ: «ئەبووبەكرم بینی زاری بە دەست گرتووەو رایدەكێشێ و سزای دەدا. گوتم ئەی جێگری پێغەمبەری خوا! چ بووە؟ گوتی: ئەمە تووشی گێچەڵی كردووم».

پێغەمبەر فەرمووی: «زۆربەی هەڵەكانی مرۆڤ لە زمانیدا دانراوە». دیسان فەرمووی: «لە ساناترین عیبادەتەكان ئاگادارتان دەكەمەوە: بێدەنگی و ئاكار بەرزی». دیسان فەرمووی: «ئەوەی بە پەروەردگار و رۆژی پەسڵان بڕوای هەیە، پێی بڵێن بێجگە لە چاكە هیچ مەڵێ یان هەر هیچ مەڵێ و بێدەنگ بە».

---

١ ـ مێمل: بەلا، ئافەت.

٢ ـ قورئان، ٤/١١٤.

بە عیسایان گوت: «شتێکمان پێ فێر کە بمانباتە بەهەشت». گوتی: «چجار مەپەیڤن». گوتیان: ناتوانین. گوتی: «کەواتە، بێجگە لە چاکە هیچ مەڵێن».

پێغەمبەر فەرمووی: «کە باوەڕدارێکی بێدەنگ و لەسەر خۆت بینی، نزیکی بەوە، چونکە ئەو کەسە هۆزان و بلیمەتە».

عیسا گوتی: «عیبادەت دە بەشە؛ نۆی بێدەنگییەو یەکێکی هەڵاتن لە خەڵکە». پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی زۆر دەدوێ هەڵەی زۆر دەکا، ئەوەی بە زۆری تووشی هەڵە بێ، زۆرتر گوناح دەکا؛ ئەوەش زۆرتر گوناح کا، ئاور لێی نزیکترە». بەم بۆنە بوو کە ئەبووبەکر بەردێکی لە نێو دەم دەنا، تاکەمتر قسە بکا.

ئیبنی مەسعوود گوتی: «بڕینی هیچ شت، چاتر لە زمان نییە». یوونسی عوبەید گوتی: «کەسم نەدی کە چاودێری زمانی بێ و لە هەموو کردەوەکانیدا دیاری نەدابێ».

لە لای مەعاویە کۆڕی قسە گەرم بوو، ئەحنەف بێدەنگ بوو. لێیان پرسی: «بۆچ بێدەنگی؟» گوتی: «ئەگەر درۆ بڵێم لە خوا دەترسم، ئەگەر ڕاست دەڵێم لە ئێوە دەترسم».

ڕەبیع کوڕی خەسیم بیست ساڵ باسی دونیای نەکرد؛ بەیانیان کە هەڵدەستا، قەڵەم و کاغەزی ڕادەناو هەرچی دەگوت دەینووسی و شەو دەیژمارد لەگەڵ خۆی حیسابی دەکرد.

بۆیە ئەم هەمووە لەسەر چاکەی بێدەنگی بێژرا، چونکە زیانەکانی زمان زۆرن و زۆرجار بە بێ هۆ دێنە سەر زار. گوتن خۆش و سانایە، کەچی لێک هەڵاواردنی چاک و خراپ دژوارە؛ بەبێدەنگی مرۆ دەتوانێ خۆی لەو ئۆباڵە ڕزگار کا و دڵ و وزەی بۆ بیرووبیر و ڕامان تەرخان کا.

ئاخاوتن چوار بەشە: یەکەم ئەویە کە سەر لەبەری زیانە؛ دووەم ئەوەیە کە هەم زیانی هەیە و هەم قازانج؛ سێهەم ئەوەیە کە نە زیانی هەیە و نە قازانج، ئەم پەیڤە بەبێکەڵکە و لە زیانی هەر ئەوە بەستە کە تەمەن بە فیڕۆ دەدا؛ چوارەم ئەوەیە کە سەرلەبەری قازانج و خێرە. کەواتە سێ چواری قسە، لەوتن نایە و شیاوی گوتن نییە و تەنیا یەک چواری لەبارە؛ ئەوەش ئەوەیە کە گوتی: «الاَّ مَن اَمَرَ بِصَدَقَةٍ اَو مَعرُوفٍ». ڕاستەقینەی ئەم پەیڤە کە پەیغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی بێدەنگ بوو، ڕزگار بوو»، لێت خویان نابێ تا ئەوەی کە مینەڵی زمان نەناسی. ئەوەش یازدە دانەیەو یەک بە یەکیان ڕاڤە دەکەین و دەیڵێینەوە.

## ئافەتەکانی زمان

**ئافەتی یەکەم** ئەوەیە پەیڤی بڵێی کە گوتنی پێویست نەبێ؛ ئەگەر نەیبێژی هیچ زیانێ بە دین و دونیات ناگاو بەم پەیڤە لە چاکەی ئیسلام خۆت دوور خستۆتەوە؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «مِن

حُسنِ اسلامِ المَرءِ تَرکُهَ ما لا یَعنیه»؛ واتە: دەسهێشتنی ئەو شتانەی دەکرێ وازیان لێبهێنرێ، چاکەی دینی تێدایە. ئەمە وەکوو ئەوەیە کە لەگەڵ تاقمێ دابنیشی و سەربهوردی سەفەرت بۆیان بگێڕیەوە، نووک‌وبەدی دانەخەی، لەو شارانەی کە دیوتن تا ئەو خۆراکانەی خواردووتن، سەرلەبەری بگێڕیەوە. هەموو ئەم باسە بێ‌کەلک و نرخە، چونکە نەگێڕانەوەی زیان لە کەس نادا. هەروەها ئەگەر کەسێک ببینی و پرسێکت پێ کرد کە هیچ پێوەندی بە تۆوە نەبوو -هەرچەند هیچ زیانیشی نەبوو- وەکوو ئەوەی لە یەکێک بپرسی «بە رۆژووی؟» ئەگەر راستت پێ بڵێ عیبادەتەکەی خۆی ئاشکرا کردووە و ئەمەش جوان نییە؛ یاخۆ لە یەکێک بپرسی «لە کوێڕا هاتووی؟ چ دەکەی؟ چت دەکرد؟» رەنگە پێی نەکری راستت پێ بڵێ و تووشی درۆ بێ، هەموو ئەمانە پڕوپووچن.

دەڵێن لوقمان یەک ساڵی تەواو دەڕۆیشتە لای داوودی پەیغەمبەر و داوود خەریکی چێ‌کردنی زرێ بوو. لوقمان زۆری پێ خۆش بوو بزانێ چی دروست دەکا، بەڵام نەیپرسی تا دوایی هات و کردییە بەری و گوتی: «بەرگێکی لەبارە بۆ شەڕ». لوقمان زانی و گوتی: «بێدەنگی بەردەبارییە، بەڵام کەس حەزی لێ نییە».

هۆی ئەم پرسیارانەش ئەوەیەکە دەیەوێ لە بارودۆخی خەڵکی تێبگا تا سەری قسە دابێنێ و سەری ئاشنایی داخا. دەرمانی ئەوەش وایە کە دەبێ رابمێنێ و تێبگا کە مردن لە رێگایە و زۆر نزیکە و هەر زیکر و یادێکی پەروەردگار، پاشەنازێکە بۆ دواڕۆژ، گەر بیفەوتێنێ، تووشی زیان بووە. ئەمە دەرمانی زانستیە؛ بەڵام دەرمانی کردەیی ئەوەیە کە یا دوورەپەرێزی کا یاخۆ بەردێ لە نێو دەمی دانێ.

لە خەبەردا هاتووە کە رۆژی شەڕی ئوحۆد گەنجێک شەهید بوو. دیانەوە. لەبەر برسیەتی بەردێکی لەسەر زگی بەستبوو. دایکی خاکی لەسەر روومەتی لادا و گوتی: «هنیئاً لکَ الجَنَّة»؛ بەهەشت لێ پیرۆز بێ. پێغەمبەر فەرمووی: «چۆن دەزانی؟ رەنگە ئێرەیی بەشتێ بردبێ کە هیچ کەڵکی بۆ نەبووبێ، یاخۆ لە سەرشتێ دوابێ کە هیچ قازانجی بۆ نەبووبێ». واتای ئەوەیە کە لێی دەپرسنەوە، کەچی پیرۆز و خۆش ئەوەیە کە هیچ لێپرسینەوەی نەبێ.

جارێک پێغەمبەر فەرمووی: «ئێستا بەهەشتیەک لە دەرگا دێتە ژوور». عەبدوڵڵای کوڕی سەلام هاتە ژوور. پێیان گوت پێغەمبەر وای فەرمووە. لێیان پرسی: «چیت کردووە؟» گوتی: کردەوەم کەمە، بەڵام هەرچی پێوەندی پێمەوە نەبێ وازی لێ دێنم و خراپەم بۆ خەڵکی ناوێ.

بزانە، هەرچی لە رستەیەکدا بتوانی بیبێژی، گەر درێژەی پێ بدەی و بیکەیتە دوو رستە، ئەو رستە دووەمە پڕوپووچەو ئۆباڵی گەردنە.

یەکێک لە یارانی پێغەمبەر گوتی: «کەس هەیە لەگەڵم قسە دەکا و پەرسڤ گەڕاندنەوەی بۆم لە

ئاوی سارد بۆ تینوو خۆشترە، بەڵام هیچ ناڵێم، نەکوا هیچ و پووچ بێ». موتەڕڕیف کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: «دەبێ شانوشکۆی پەروەردگار لە دڵتان پتر لەوەی بێ کە لە هەر پەیڤێکدا ناوی بەرن؛ هەروەک بە چوار پێ و پشیلە دەڵێن: خوا واو وات لێ کا». پێغەمبەر فەرمووی: «خۆزگە بەو کەسەی خۆی لە قسەی زیادی پاراست و سامانی زیادی دابەش کرد»؛ واتە گرێی گیرفانی کردەوە و لەسەر زاری دانا. پێغەمبەر گوتی: «هیچ شتیان نەدایە مرۆڤ خراپتر لە زمانی درێژ».

هەرچی بڵێی، بۆت دەنوسرێ؛ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ[١]. گەر فریشتەکان بە خۆڕایی قسەکانیان نەدەنووسیەوەو بۆ هەر پەیڤێ پارەیەکیان دەسەند، لە ترسی پارە، لە دە قسە یەکی نەدەبێژرا. کەچی خەساری فەوتانی کات لە قسەکردندا، گەلێک زۆرتر لە زیانی پارەیە، ئەگەر وەریان بگرتایە.

**ئافەتی دووەم** پەیڤین لەسەر چەمکی بەتاڵ و گوناح. بەتاڵ و پووچەڵ ئەوەیە کە باس لە داهێنان بکا، یان لەسەر چۆنییەتی شەڕی یارانی پەیغەمبەر بدوێ. گوناح و تاوانیش ئەوەیە چیرۆکی داوێنپیسی بگێڕیتەوە، یان باسی کۆڕێک کە شەڕە قسەی تێدا کرابێ و بە جنێو و قسەی کرێت دوایی هاتبێ بگێڕیتەوە، یاخۆ سەربهوردێکی ناپەسەن و گەپچاڕ بگێڕیتەوە بۆ پێکەنین؛ ئەمانە هەمووی گوناحن، بەڵام نە وەکوو ئافەتی یەکەم؛ چونکە ئەوەی پێشوو نزمترین ئاستی بوو.

پەیغەمبەر فەرمووی: «کەسی وا هەیە کە قسەیەک دەکا و هیچ گوێی پێ نادا، کەچی ئەو پەیڤە دەیباتە ناخی دۆزەخ؛ یاخۆ ڕەنگە شتێک بڵێ و گوێی پێ نەدا، کەچی هەر ئەو قسە بیگەیەنێتە تەشقی بەهەشت».

**ئافەتی سێهەم** شەڕە قسەیە و بەو کەسە دەڵێن مەرایی. کەس هەیە خووی بەوە کردووە هەرکەس شتێ بڵێ ئەم لە پەرسڤیدا دەڵێ: «نە، وا نییە». واتای ئەم پەیڤەش ئەوەیە کە «تۆ نەزان و گێل و درۆزنی و من ژیر و لێهاتوو و ڕاسبێژم». بەم یەک قسە، دوو دانستەی زۆر کوشندی لە خۆدا بەهێز کردووە: یەک لووتبەرزی و خۆبەزلزانی و دووەم تانەدان لە کەسێک.

لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی لە ئاخاوتندا واز لە شەڕەقسەو دوژمنایەتی بێنێ و قسەی بێکەڵک نەڵێ، لە بەهەشتدا خانوویەکی پێ دەدەن؛ ئەگەر قسەکەی ڕاست بێ کەچی دیسان نەیڵێ، خانوویەکی لە تەشقی بەهەشتیدا پێ دەدەن».

هۆی ئەم پاداشە ئەوەیە کە پشوودرێژی و خۆڕاگری لە هەمبەر شەڕەقسە و درۆوە دژوارترە.

---

١ ـ (قورئان، ١٨/٥٠) هەر ورتەیەکی لە دەم دەرچێ، چاوەدێرێکی لە لاهەیە. (هـ).

دیسان فەرمووی: «بڕوای خەڵکی تەواو نابێ، مەگین ئەوەی لە شەڕەقسە واز بێنن، هەرچەند ڕاستیش بێ».

بزانە، شەڕەقسە تەنیا بۆ باسی دین نییە، بەڵکوو ئەگەر کەسێک بڵێ «ئەم هەنارە شرینە» و تۆ بڵێی «نە، شرین نییە»، یا خۆ کەسێک بڵێ: «تا فلان شوێن ئەوەندە فرسەخ ڕێگەیە» کەچی تۆ بڵێی «نە»، ئەمانەش کرێت و ناڕەوان.

پەیغەمبەر فەرمووی: «کەفارەی هەر ڕکەبەرییەک، دوو رەکات نوێژە». بە کورتی ڕکەبەرێ بریتییە لەوەی کە کەسێک پەیڤێکی هەڵە بڵێ و تۆ هەڵەکەی بە ڕوودا بدەیتەوە. ئەمەش حەرامە؛ چونکە دەبێتە هۆی ڕەنجاندنی کەسێک و ڕەنجاندنی هیچ موسولمانێ لەخۆڕا، شیاو نییە. لە ئاوەها کاتێکدا پەرسڤ وەرگەڕاندنەوە پێویست نییە، کەچی بێدەنگ بوون نیشانەی بەرزی بڕوایە. بەلام کە ئەم ڕکەبەرێیە لە ئاییندا بوو، شەڕەقسەی پێ دەڵێن. ئەمەش دزێوە، مەگین ئەوەی بۆ ئامۆژگاری بێ و لە تەنیاییدا لە ڕاستەڕێی شارەزای کەی؛ ئەگەر هیوای ئەوە هەبوو کە بیسەلمێنێ و دانی پێدا بنێ، گوتن باشترە؛ بەلام ئەگەر نە، بێدەنگی چاترە.

پێغەمبەر گوتی: «هیچ هۆزێک ڕێیان بزر نەکرد، تا ئەو کاتەی تووشی شەڕەقسە بوون». لوقمان بە خورتی خۆی ڕاسپارد: «دەگەڵ زانایان شەڕەقسە مەکە، چونکە بە دوژمنت دەزانن».

بزانە، هیچ شتێ بەقەدەر بێدەنگبوون لە کاتی شەڕەقسە و قسەی پڕوپووچدا، دژوار نییە؛ بۆیە لە ڕیزی هێژاترین کۆشەوەکان دانراوە. داوودی تایی دوورەپەرێزی گرت. بووحەنیفە پێی گوت: «بۆ نایتە دەرێ؟» گوتی: «بەدوورەپەرێزی خۆم لە شەڕەقسە دەپارێزم». گوتی: «وەرە نێو کۆڕی شەڕەقسە و گوێبگرە و هیچ مەڵێ». گوتی: «وام کرد، هیچ کۆشەوەیەک دژوارتر لەوەم نەدی».
هیچ زیانێ پتر لەوە نییە کە لە شارێکدا دەمارگیری مەزهەبی هەبێ و تاقمێ کە خولیای پلە و پاگە و پێڕەون، بانگ هەڵبدەن کە شەڕەقسە، بەشێ لە دینە؛ کەچی ئەوە لووتبەرزی و دەمار زلییە کە ئەوەی لێ داوا دەکا و بە پاژێ لە دینی پێ پیشان دەدا؛ جا کە ئەو بەلایەی لە دڵ سەقامگیر بوو، ئیدی خۆ لێبواردنی گەلێک دژوارە، چونکە نەفس چەن چێژی لێ دەبا. مالک کوڕی ئەنەس دەڵێ: «شەڕەقسە لە دین نییە». سەرلەبەری پێشوونان بەرگرییان لە شەڕەقسە کردووە؛ بەلام ئەگەر داهێنەرێکیان بینیبێ، بە ئایەتی قورئان و ئەخباری پێغەمبەر لەگەڵی دواون. بەبێ ڕکەبەرێ و درێژدادڕی. ئەگەر لە سەری کاریگەر نەبووبێ، خۆیان لێ بواردووە.

**ئافەتی چوارەم** دژایەتییە لەسەر ماڵوسامان و ڕۆیشتنە لای دادوەر. زیانی ئەمە گەلێک گەورەیە. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی بەبێ زانیاری دەگەڵ کەسێک دژایەتی کا، دەکەوێتە بەر نەفرەتی

خودا، تا ئەو دەمەی کە بێدەنگ بێ». گوتوویانە: «هیچ شت وەکوو دژایەتی‌کردن لەسەر سامان و ماڵ ئاژاوە ناخاتە دڵ و مێرخاسی لە دین ناباو خۆشی لە دڵ ناتارێنێ». هەروەها گوتوویانە هیچ پارێزکارێ لەسەر ماڵ دژایەتی لەگەڵ کەس ناکا، چونکە بەبێ درێژدادڕی دوایی نایە و کەچی پارێزکار قسەی زۆر ناکا؛ هەر هیچ نەبێ ناتوانێ لەگەڵ دوژمنی بە چاکی بدوێ و ئاکاری جوان بێ، لە کاتێکدا قسەی خۆش‌کردن و ڕووگەش‌بوون گەلێک بەرز و هێژایە. کەواتە هەرکەس ناکۆکییەکی بوو باشتر وایە گەر پێی کرا وازی لێ بێنێ؛ گەریش پێی نەکرا، نابی بێجگە لە ڕاست چیدی بڵێ و توند داخوڕێ و داوای زۆرتر کا؛ چونکە هەمووی ئەمانە هۆی فەوتاندنی دینن.

**ئافەتی پێنجەم** جنێودانە. پێغەمبەر فەرمووی: «بەهەشت حەرامە لەو کەسەی جنێو دەدا». دیسان فەرمووی: «لە دۆژەهدا کەسانێک هەن کە لە زاریانەوە بۆنێکی زۆر پیس بڵاو دەبێتەوە و لە پیسی ئەو بۆنە هەموو خەڵکی دۆژەهوەڕس دەبن و دەڵێن: ئەم بۆنە پیسە هی کێیە؟ لە پەرسڤیاندا دەڵێن: ئەمە هی ئەو کەسەیە لە هەر کویدا قسەیەکی سهێت[1] و ناحەز هەبایە، حەزی لێدەکرد و دەیگوتەوە».

ئیبراهیمی کوڕی مەیسەرە دەڵێ: «ئەوەی جنێوفرۆش بێ، ڕۆژی پەسڵان لە بیچمی سەگێکدا ئاشکرا دەبێ».

زۆربەی جنێوەکان باسی پێوەندی ژن‌وپیاون، هەر بەو جۆرەی کە خوو و خدەی خراپکارانە. دژوێن[2]، چەسپاندنی تۆمەتی ئەو کارە نابەجێیانەیە بە کەسێکەوە.

پێغەمبەر فەرمووی: «لەحنەتی خودا لەو کەسەی کە دایک و باب لێی ڕەزا نین؛ هەروەها ئەو کەسانەی کە جوێن بە دایک و بابیان دەدەن». گوتیان: «ئەمە کاری کێیە، ئەی پێغەمبەری خوا؟» فەرمووی: «ئەو کەسەیە جنێو بە داک و بابی خەڵکی دەدا، تا دژوێنی پێ بدەنەوە. ئەو جوێنە خۆی داویە بە دایک و بابی».

بزانە، باسی نزیکی (پێوەندی ژن و پیاو) دەبێ بە لاتاو[3] بوێژرێ تا دزێو نەبێ؛ هەموو باسێکی کرێتیش هەر دەبێ بە لاتاو بێژرێ و بەراشکاوی نەیتەگوتن. هەروەها ناوی ژنانیش نابێ بە ئاشکرایی بێژرێ، بەڵکوو دەبێ بڵێن «ڕووپۆشراوان».

ئەگەر کەسێک برینێکی ناحەزی هەیە، وەکوو بەوەسیر و سووزەنەک و شتی‌وا، دەبێ بڵێن

---

١- سهێت: دزیو، ناحەز.

٢- دژوێن: جنێو.

٣ - لاتاو: قسەی بە تێکول.

«نەخۆشی». دەبێ لە گوتنی ئەم پەیڤانەدا ڕێز و حورمەت رابگیرێ، چونکە بە راشکاوی گوتنی ئەم شتانە جۆرێک جنێوە.

**ئافەتی شەشەم**. لەحنەت کردنە. بزانە کە لەحنەت ناردن بۆ سەر هەرشتێ - وەکوو چوار پێ و مرۆڤ و جل‌وبەرگ و...- ناحەز و دزێوە. پێغەمبەر فەرمووی: «بڕوادار لەحنەت ناکا». جارێ ژنێ کە بوو بە هاوسەفەری پەیغەمبەر، لەڕێدا لەحنەتی کرد لە حوشترێک. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەو حوشترە رووت کەنەوەو لە کاروانی وەدەرنێن؛ چونکە لەحنەت لێکراوە». ماوەیەک ئەو حوشترە بە بەرەڵلایی دەسووڕایەوەو کەس توخنی نەدەکەوت.

ئەبوودەردا دەڵێ: «کە مرۆڤ زەوی یا شتێکی‌تری لەحنەت کرد، لە پەرسڤ وەرگەڕاندنیدا دەڵێ: "لە نێوانی من و تۆدا، لەحنەت لەو کەسەمان کە لە هەمبەر پەروەردگار سەر بزیوترە"». رۆژێ ئەبووبەکر لەحنەتی لە شتێ کرد. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەی ئەبووبەکر! سدیق و لەحنەت، سدیق و لەحنەت!» گوتی: «لا وَ رَبِّ الکعبه[1]»؛ پاشگەز بووە و کۆیلەیەکی لە کەفارەی ئەوەدا رزگار کرد.

بزانە، لەحنەت ناردن بۆ خەڵک‌وخوا ناڕەوایە، مەگین بۆ سەرجەمی ئەو کەسانەی خراپکارن؛ وەکوو بڵێی: «لەحنەت لە ستەمکاران! لە داوێن پیسان و خراپکاران! لە کافران!». بەڵام لە گوتنی «لەحنەت لە موعتەزیلە و کەڕرامی» مەترسی هەیە و خراپەی لێ دەبێتەوە؛ دەبێ دووری لێ بگرن؛ مەگین ئەوەی لە شەرعدا وتەی لەحنەت بۆ ئەم کەسانە هاتبێ و خەبەرێکی راستی لەسەر بێ. بەڵام لەحنەت ناردن بۆ کەسێکی تایبەت، تەنیا بۆ کەسێک رەوایە کە شەرع ئاشکرای کردبێ کە بە کافری مردووە؛ وەکوو فیرعەون و بووجەهل. پەیغەمبەر هۆزێکی کافری ناوبردو لەحنەتی لێ کردن، چون ئارخەیان بوو بە کافری دەمرن و راستەڕێیان لێ روون نابێ. بەڵام لەحنەت ناردن بۆ جوولەکەیەکی تایبەت ناڕەوایە، چونکە رەنگە هەر ئەو جووە بەر لە مردن ببێتە موسوڵمان و پاش مردن بڕواتە بەهەشت، تەنانەت رەنگە لەم کەسەش -لەحنەتکەر- چاتر و بەرزتر بێ. رەنگە یەکێک بڵێ: «رەحمەت بۆ موسوڵمان دەنێرین، هەرچەند رەنگە بە کافری بمرێ، بۆ کافریش دەتوانین لەحنەت بنێرین، چونکە لەم دەمەدا کافرە و رەحمەتی وە بەر نەکەوتووە»؛ ئەم پەیڤە هەڵەیە، چونکوو واتای رەحمەت ئەوەیە کە ئەو کەسە لەسەر موسوڵمانی بمێنێ، کە موسوڵمانی هۆی رەحمەتە. کەچی ناڕەوایە بڵێی «خوای دلۆڤان لەسەر کافری و لاڕێیی رایگرێ»، کەواتە نابێ بۆ کەسێکی دیاریکراو لەحنەت بنێری.

---

[1] ـ سوێند بە خودانی کەعبە نە.

گەر کەسێک بڵێ: «لەحنەتکردن لە یەزید ڕەوایە؟» دەڵێین: دەتوانێ بڵێی: «لەحنەت لە کوشندەی حوسێن، گەر بەر لە مردن لە کردەی خۆی پاشگەز نەبووبێ»؛ چونکە کوشتن پتر لە کفر نییە و کە پاشگەز بوو، لەحنەت بۆ ناردنی ناڕەوایە؛ وەحشی هەمزەی کوشت و بوو بە موسوڵمان و لەحنەتی لەسەرکەوت. بەڵام ئاشکرا نییە کە یەزید حوسێنی کوشتبێ و هەندێ گوتوویانە ئەو فەرمانی داوەو تاقمێ گوتوویانە فەرمانی نەداوە، بەڵام ڕازی بووە. ناڕەوایە بە بوختان کردن گوناح بە کەسێکەوە چەسپانن؛ ئەم کارە بۆ خۆی گوناحێکە. لەم سەردەمەدا زۆر گەورە پیاویان بە ناڕەوا کوشت و کەس نەیزانی کێ فەرمانی داوە، کەواتە پاش چوارسەد و چەن ساڵ چۆن دەزانرێ کێ فەرمانی کوشتنی حوسێنی داوە و پەروەردگاری دلۆڤان خەڵکی لەم پەیڤە پڕوپووچانە و لەم مەترسییە گەورەیە بێنیاز کردووە و ئەگەر کەسێک بە درێژایی تەمەنی تەنیا جارێکیش لەحنەت بۆ شەیتان نەنێرێ، لە ڕۆژی پەسلاندا لێی ناپرسن «بۆچی لەحنەتت نەنارد؟» بەڵام گەر بۆ کەسێک بنێرێ کە لێی ڕوون نەبێ و دڕدۆنگ بێ، لێی دەپرسنەوە کە بۆت گوت و بۆچیت کرد.

یەکێک بە پێغەمبەری گوت: «قەوینتیم بۆ بکە». فەرمووی: «لەحنەت مەنێرە». دەڵێن لەحنەتی باوەڕدار وەکی کوشتنی ئادەمیزادە. هەندێ گوتوویانە ئەمە حەدیسێکی پەیغەمبەرە.

کەواتە، خەریکی بیر و ویر و یادی خودا بوون، چاترە لە لەحنەت بۆ شەیتان ناردن، چجای کەسی-تر. ئەوەی لەحنەت لە کەسیتر کا و بە خۆی بڵێ ئەمە لە پتەوی و دینداریمە، ئەوە شەیتان خاپاندوویە و ڕەدووی هەواو هەوەسی کەوتووە.

**ئافەتی حەوتەم**، شیعر و گۆرانییە. ئەم چەمکەمان لە باسی «سەما»دا ڕاڤە کرد و ئاشکرا بوو کە حەرام نییە؛ چونکە لە لای پەیغەمبەر شیعریان خوێندۆتەوە و پەیغەمبەر بە حەسسانی گوت تا پەرسڤی هەجوی کافرەکان بداتەوە. بەڵام ئەوەی درۆ بێ، یان هەجوی موسوڵمانێ بێ، یا پێدا بەدرۆ پێداهەڵگوتن بێ، ناڕەوایە. بەڵام ئەوەی بۆ چواندن بێ -چونکە ئەوەی سەنعەتی شیعرییە- هەر چەن درۆ بێ، حەرام نییە. چونکە مەبەست، ئەوە نییە کە باوەڕی پێ بهێنن؛ لەم شیعرانەیان بە عارەبی لە لای پێغەمبەر هۆنیوەتەوە.

**ئافەتی هەشتەم**، گاڵتە و جەفەنگە. پەیغەمبەر بە گشتی نەهی لە گاڵتە کردووە. بەڵام کەمۆکێکی ناوەبەناوە جوانە و لە مەرجەکانی ڕووخۆشییە. بەو مەرجەی نەبێتە خووی هەمیشەیی و هەروەها بێجگە لە ڕاستی چیدی نەڵێ. چونکە گاڵتەی زۆر تەمەنی بە فیڕۆ دەدا و کەنینی زۆر دڵ ڕەش دەکاتەوەو سام و گەورەیی پیاو دەشکێنێ و ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی خەڵک لێی دوور کەون.

پێغەمبەر فەرمووی: «من گاڵتە دەکەم، بەڵام بێجگە لە راستی چیتر ناڵێم». دیسان فەرمووی: «کەسی وا هەیە شتێ دەڵێ تا خەڵک پێبکەنن، بەڵام ئەو کەسە لە ئاستی خۆی دادەکەوێ، زۆرتر لەوەی کەسێک لە ئاسمان بەرەو زەوی بەر بێتەوە».

قاقای پێکەنیس، دزیوە و کەنین نابێ لە زەردەخەنە فرەتر بێ. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەگەر ئەوەی من دەیزانم، ئەنگۆ بتانزانیبا، کەمتر پێدەکەنین و زۆرتر دەگریان». بە یەکێکتری گوت: «ئەتزانیوە کە بێشک رێت دەکەوێتە دۆزەخ؟ پەروەردگار فەرموویە: وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا[1]». گوتی: «زانیومە». فەرمووی: «دڵنیای کە لە جەحەننەم دەربازی دەبی؟» گوتی «نە». فەرمووی: «دەیسا ئەم کەنینەت بۆچییە و چجای پێکەنینە؟»

«عطاء سُلمی» چل ساڵ پێنەکەنی. «وُهَیب بن الورد» تاقمێکی بینی لە رۆژی جێژنی رەمەزاندا پێدەکەنین. گوتی: «گەر پەروەردگار ئەم تاقمەی بوردووەو رۆژوویانی وەرگرتووە، ئەمە کار و کردەی شوکرانەبژێران نییە و ئەگەر وەرینەگرتووە، ئەم کردەوە، کردەی لە خواترسان نییە». ئیبنی عەبباس گوتی: «ئەوەی گوناح کاو پێبکەنێ، دەرواتە دۆزەخو بە کوڵ دەگرییێ». محەممەدی واسیع گوتی: «ئەگەر کەسێک لە بەهەشتدا بگرییێ، سەیرە؟» گوتیان: «سەیرە». گوتی: «دەی ئەو کەسەی کە لە دونیا پێدەکەنێ و نازانێ ماڵی دوارۆژی لە دۆزەخ یان بەهەشت، پێکەنینی سەیرتر نییە».

لە خەبەردایە کە عارەبێ سواری حوشتر بوو و بەنیاز بوو بڕواتە دیداری پێغەمبەری خودا. هەرچەن هانیدا، حوشترەکەی سڵی دەکردو دەگەڕایەوە و یارانی پێی پێدەکەنین. حوشترەکە کابرای دایخست و دەم و دەست مرد. ئەسحاب گوتیان: «یا رەسوولەڵلا! ئەو پیاوە لە حوشترەکەی داکەوت و مرد». فەرمووی: «بەڵێ وایە، دەمی ئێوەش پڕ لە خوێنی وییە»؛ واتە پێی پێکەنین.

عومەر کوڕی عەبدولعەزیز گوتی: «لە خودا بترسن و قەشمەری مەکەن، چونکە رق و قینتان لە دڵ پێک دێنێ و کاری سهێتی لێ دێتە دی؛ کە پێکڕا دانشتن، باسی قورئان کەن، کە پێتان نەکرا، پەیڤی جوانی پیاوچاکان وەگێڕن».

عومەر دەڵێ: «هەرکەس لەگەڵ کەسێکیتر گاڵتەو جەفەنگ کا، لە چاوی ئەو کەسەدا سووک و بێنرخ دەبێ».

لە هەموو تەمەنی پەیغەمبەردا دوو سێ قسەی گاڵتەیان گێڕاوەتەوە: بە پیرەژنێکی گوت: «پیرەژن ناڕواتە بەهەشت». پیرێژن گریا. فەرمووی: «ئەس پیرەژن! خۆت خەمبار مەکە، چونکە

---

1 ـ قورئان (۷۱/۱۹) هەموو کەستان ـ نیلا و بیللا ـ هەر دەبێ بچنە جەحەندەم، بڕیارێکە پەروەرندەی تۆ داویەتی و هەر دەبێ جێبەجێ‌بێ. (هـ).

سەرەتا گەنج دەبیتەوە پاشان دەڕۆیتە نێو بەهەشتەوە». ژنێک پێی گوت: «مێردەکەم گاست دەکا». فەرمووی: «مێردت ئەوەیە: سپیایی لە چاویدایە؟» گوتی: «نە، مێردەکەم چاوی سپی نییە». فەرمووی: «ژنەکە! مرۆڤ هەیە چاوی سپیایی تێدا نەبێ؟» ژنێ گوتی: «سواری حوشترم کە». فەرمووی: «سواری بێچووی حوشترت دەکەم». گوتی: «نامهەوێ، دامدەخا». فەرمووی: «هیچ حوشترێ نییە، بێچووی حوشتر نەبێ».

ئەبووتەڵحە منداڵێکی بوو بە ناوی ئەبووعومەیر. ئەو منداڵە چۆلەکەیەکی بوو، چۆلەکە مرد و ئەویش بۆی دەگریا. پێغەمبەر بینی و گوتی: «یا باعُمَیر! ما فَعَص النُغَیر لنُغیر؟»؛ واتە: ئەی بابی عومەیر! بێچووە چۆلەکەکەت، چی لە بەچکە مەلیچکەکەی کرد؟

زۆربەی ئەم گاڵتانەی دەگەڵ ژنان و منداڵان بووە، تا دڵخۆشییان بداتەوە و بەهۆی سامیەوە لێی نەتارن.

لەگەڵ ژنەکانی خۆیشی هەر ئەم قسە خۆش و گاڵتانەی بۆ دڵخۆش‌کردنیان هەبووە. عایشە دەڵێ، سوودە هات بۆ لام. لە شیر شتێکم لێ نابوو. پێم گوت: «بخۆ». گوتی ناخۆم. گوتم: «گەر نەخۆی دەیساوم پێتدا». گوتی ناخۆم. دەستم برد و نەختێکم بە روویدا ساوی. پەیغەمبەر لە نێوانماندا دانشتبوو. ئەویش دەستی هێنا و نەختێکی بە رووی مندا مالی و لێوی بە بزە پشکووت.

زەحاک کوڕی یووسف گەلێک دزیو بوو. دەگەڵ پێغەمبەر دانشتبوو. گوتی: «ئەی پێغەمبەر! دوو ژنم هەیە بەدەوتر لە عایشە. گەر دەتەوێ یەکیان تەلاق دەم تا تۆ بیخوازی». ئەمەی بە گاڵتەوە دەگوت تا عایشە گوێی لێ بێ. عایشە گوتی: «ئەوان جوانترن یان تۆ؟» گوتی: «من». پەیغەمبەر لەو پرسیارەی عایشە زەردە خەنەیەکی کرد، چونکە کابرا زۆر ناشیرین بوو. ئەمە بەر لەوەی بوو کە ئایەتی حیجابی ژنان بێتە خوارەوە.

پەیغەمبەر بە سوهەیبی گوت: «چاوت دیشێت و خورما دەخۆی؟» گوتی: «بەولایترم دەیخۆم». پێغەمبەر بزەیکی کرد.

خەووات کوڕی جوبەیر حەزی لە ژنان دەکرد. رۆژێ لە رێی مەککەدا لەگەڵ تاقمێ لە ژناندا راوەستابوو. پەیغەمبەر چاوی پێکەوت، جوبەیر زۆر شەرمەسار بوو. گوتی: «چ دەکەی؟» گوتی: «حوشترێکی سەربزێوم هەیە، بە تەمام ئەم ئافرەتانە گوریسێکی بۆ بچنن». گوتی: «پاش ئەوە هەر جار کە پەیغەمبەرم دەدی، پێی دەگوتم: "ئەی خەووات! ئەو حوشترەت وازی لە سەرکەشی نەهێنا؟" شەرمەزار دەبووم و بێدەنگ دەبووم. جارێک بە سواری ولاخێ تێدەپەریم، پێغەمبەرم بینی، فەرمووی: "ئەی خەووات! دوایین هەواڵی ئەو حوشترە سەربزێوەت چییە؟" گوتم: "بە پەروەردگارێک تۆی بەڕاستی ناردووە بۆ رێنۆمایی خەڵک، لەو کاتەوە ئیسلامم هێناوە، سەرکەشی

نەکردووە". فەرمووی: "اَللّٰهُ اَکبَرُ اَللّٰهُمَّ اَهد اَبا عَبداللّٰه"».

نوعەیمانی ئەنساری زۆر گاڵتەچی بوو، زۆریش دەیخواردەوە. هەرجار دەیانهێنایە لای پێغەمبەر و بە پێڵاو لێی دەدا. جارێک یەکێک لە ئەسحاب گوتی: «بە لەحنەتی خودا بی! چەن دەخۆیتەوە؟» پێغەمبەر فەرمووی: «لەحنەتی لێ مەکە، چونکە خودا و پێغەمبەری خۆش دەوێ». ئەم کابرا هەرجار میوەیەکی نۆبەریان دەهێنایە مەدینە، دەیکڕی و بۆ پێغەمبەری دەنارد و دەیگوت دیارییە. پاشان کە کابرای فرۆشندە داوای پارەی دەکرد، دەیبردە لای پێغەمبەر و دەیگوت: «ئەمان خواردوویانە، پارەکەی لەمان بسێنە». پێغەمبەر زەردەخەنەیەکی دەکرد و پارەی پێ دەدا. پاشان پەیغەمبەر لێی دەپرسی: «بۆچیت هێنا؟» دەیگوت: «پارەم نەبوو، نەیشم دەویست بێجگە لە تۆ کەسیتر بیخوا؛ چ بکەم».

ئەمە هەمووی ئەو گاڵتانەیە کە لە پێغەمبەریان گێڕاوەتەوە. لە هەمووشیاندا نە باسی هیچ و پووچ و ناڕاست هەیە، نە ئازاری بە کەس گەیاندووە و نە لە گەورەیی کەم کردۆتەوە. بەم چەشنە، جاربەجار سونەتە، بەڵام خوو پێ‌کردنی ناڕەوایە.

**ئافەتی نۆهەم** قەشمەری و دەمەلاسکێ و لاساییکردنەوە و پێکەنین بە کەسێکیتر. ئەم کارە چونکە دەبێتە هۆی زیز و زویر بوونی کەسێکی دی، حەرامە؛ خوداش فەرمووی: **لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيْرًا مِّنْهُمْ**[1] واتە: گاڵتە بە هیچ کەسێ مەکەن، بە سووکی سەیری کەس مەکەن، نەکوا ئەوان لە ئەنگۆ چاتر بن.

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس خوسپەی هەڵەی کەسێک کات، کە لە گوناحی پاشگەز بۆتەوە، نامرێ تا بەو گوناحەی تووش نەبێ». نەهی کردووە لە پێکەنین بە کەسێک کە بایەکی لێ بۆتەوە. فەرموی: «بۆچی پێدەکەنێ کەسێک بە شتێک کە لە خۆشی دەبێتەوە؟» دیسان فەرمووی: «کەسانێ کە گەمە بە خەڵکی دەکەن و پێیان پێدەکەنن، لە رۆژی پەسڵاندا دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکەنەوە و گاسیان دەکەن: "وەرن". کە دێن دەرگایان لە روو دادەخەن. لەلایەکیترەوە دەرگایەکیتریان بۆ دەکەنەوە و دەڵێن وەرن؛ کە دەڕۆن دیسان دەرگایان لە روو دادەخەن. لەمەودای نێوان ئەو خەم و هومێدەدا هەڵۆەدا دەبن، تا خۆیان تێدەگەن کە سووکایەتیان پێدەکەن و ئیدی هەرچەن گاسیان دەکەن، ناڕۆن».

گەر بە گاڵتە بە کەسێک پێ‌بکەنی و لێت زیز نەبێ، حەرام نییە. کاتێ حەرامە کە کەسێک زویر بێ.

---

[1] ـ قورئان (١١/٤٩).

**ئافەتی دەهەم**، وادە و بەڵێنی درۆیە. پێغەمبەر فەرمووی: «سێ شت هەیە کە هەرگا کەسێک یەک لەو سێیانە بێ، دوراز و دوورووە، هەر چەن نوێژ کاو رۆژوو بگرێ: قسەی درۆ بڵێ؛ گفتی راست نەبێ؛ لە ئەمانەتدا دەستی ناپاک بێ». دیسان فەرمووی: «بەڵێن، دەس‌وامە»؛ واتە بێ بەڵێنی نارەوایە.

پەروەردگار پەسنی ئیسماعیلی کرد بۆ ئەوەی بە بەڵێن بوو. دەگەڵ کەسێک بەڵێنی بوو، ئەو کەسە نەهات؛ بیست و دوو رۆژ چاوەروان ما تا بێ‌بەڵێنی نەکردبێ.

یەکێک دەیگوت: «لە بەیعەتی پێغەمبەردا بووم، بەڵێنم پێی دا بڕۆمە شوێنێک و نەڕویشتم. سێ رۆژ پاش ئەوە رۆیشتم، پێغەمبەر لەوێ بوو. فەرمووی: جوامێر لە کوێی، سێ رۆژانە چاوەڕوانتم». پەیغەمبەر بەڵێنی بە کەسێک دابوو کە: «ئەگەر بیت، هەر چیت بوێ پێتی دەدەم». رۆژی دابەشکردنی دەسکەوتی شەڕی خەیبەر هات و گوتی: «بەڵێنی من یا رەسووڵەڵلا!» فەرمووی: «هەر چیت دەوێ، بڵێ». داوای هەشتا سەر مەڕی کرد. پێی داو فەرمووی: زۆر کەمت داوا کرد؛ ئەو ژنەی قەبری یووسفی بۆ مووسا دیبەوەو مووسا گفتی پێدا کە هەر چیت نیاز بێ، پێتی دەدەم، پتر لەمەی خواست. مووسا گوتی: «چیت دەوێ، بۆتی پێک بێنم؟» گوتی: «یەکەم ئەوەی گەنج بمەوە، دووهەم لەگەڵ تۆ بڕۆمە نێو بەهەشت». لەوە بەدوا کاری ئەم پیاوە بوو بە مەتەڵۆکی عارەب و دەیانگوت: «فلان‌کەس ئاسانگیرترە لە خودانی هەشتاد هەشتا سەر مەڕ».

ئەگەر شتێکت بۆ پێک نایە، نابێ بەڵێنی مسۆگەر بدەی. پەیغەمبەر کاتی بەڵێن دان دەیفەرموو: «عسی»؛ واتە: هیوادارم کە بتوانم. کە گفتت دا تا پێت دەکرێ نابێ بیشکێنی، مەگەر ناچار بی. کە لەگەڵ کەسێک بڕیارت بوو زانایان گوتوویانە دەبێ تا کاتی نوێژ چاوەڕوان بی.

ئەوەش بزانە، کاتێ شتێک بە کەسێک دەدەی، ئەستاندنەوەی کرێتتر لە پەیمان شکێنییە؛ پەیغەمبەر ئەو کەسەی بە سەگ چواندووە، کە دەرشێتەوە و رشاوەکەی خۆی دەخواتەوە.

**ئافەتی یازدەهەم**، درۆگوتن و سوێندی بە درۆخواردنە. ئەمە لە گوناحانی گەورەیە. پەیغەمبەر فەرمووی: «درۆ دەرگایەکە بەرەو دوروویی». دیسان فەرمووی: «مرۆ جار بە جار درۆ دەکا، تا ئەوەی لە لای پەروەرندەی ناوی بە درۆزن تۆمار دەکرێ». هەروەها فەرمووی: «درۆ رۆزی کەم دەکاتەوە». هەروەها گوتی: «بازرگانان گوناحکارن». گوتیان: «بۆچی، خۆ مامەلە حەلالە؟» فەرمووی: «چونکە سوێند دەخۆن و گوناحکار دەبن، زۆر قسە دەکەن و درۆ دەڵێن».

دیسان فەرمووی: «زەلامێ پێی گوتم: "رابە". رابووم. دووزەلامم دی، یەکیان راوەستا بوو، یەکیان

دانشتبوو. ئەوەی راوەستا بوو، ئاسنێکی سەرلاری لە دەمی ئەویتر نابوو و لایەک لە دەمی رادەکێشا تا دەگەییە سەر شانی. پاشان ئەولایتری رادەکێشا. پرسیم: "ئەمە چییە؟" گوتی: "ئەمە درۆزنە، هەروا لە قەبرا ئازاری دەدەن تا رۆژی پەسلان"».

عەبدوڵلا کوڕی جەڕڕاد لە پێغەمبەری پرسی: «بڕوادار تووشی زینا دێ؟» فەرمووی: «رەنگە بێ». گوتی: «درۆ دەکا؟» فەرمووی: «نە». ئەم ئایەتەی خوێندەوە: إِنَّمَا يَفْتَرِي ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ[1]. کەسانێ درۆ دەکەن کە بروایان نییە.

عەبدوڵلای کوڕی عامر گوتی: مندالێ خەریکی یاری بوو، گاسم کرد گوتم وەرە شتێکت دەمێ. پەیغەمبەر لە مالّی ئێمە بوو، فەرمووی: «ویستت چی پێ بدەی؟» گوتم: خورما. فەرمووی: «ئەگەر نەتدایە درۆیان بۆت دەنووسی». فەرمووی: «ئاگادارتان دەکەمەوە کە لە گەورەترینی گوناحان: ئامباز دانان بۆ پەروەردگار، بێڕێزی داک و باب»، پالّی دابووەوە، راستەو بوو درێژەی بە پەیڤەکەیدا و گوتی: «ألا وَ قَول الزّور؛ هەروەها درۆدان». فەرمووی: مرۆ کە درۆ دەکەن، فریشتەکان یەک میل لێی دوور دەکەون. لەم سۆنگەوە گوتوویانە پژمین لە کاتی ئاخاوتندا، بەلگەیەکە بۆ راستی ئەو قسەیە. لە خەبەردا هاتووە کە: «پژمین هی فریشتەکانەو باوێشک هی شەیتانە». کەچی ئەگەر قسە درۆ بێ، فریشتە ئامادە نابن و بۆیە ناپژمێ. هەروەها فەرمووی: «هەرکەس درۆ بگێرێتەوە، ئەویش درۆزنە». هەروەها گوتی: «هەرکەس بە سوێندی درۆ سامانی کەسێ ببا، لە رۆژی پەسلاندا پەروەرندەی دەبینێ کە بە تووڕەییەوە سەیری دەکا». هەروەها: «هەموو دانستەیەک بۆ مرۆ دەلوێ، بێجگە درۆ و دۆخمان».

مەیموون کوڕی ئەبی شەبیب گوتی: «نامەم دەنووسێ، وتەیەک هەبوو گەر بمنووسایە، نامەکەم بەدەوتر و رازاوەتر دەبوو، بەلام درۆ بوو. بڕیارم دا بینووسم. یەکێک لە غەیبەوە گاسی کردم و گوتی: يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ[2]».

**سەرنج:**

درۆ بۆیە حەرامە، چونکە لە دلدا کاریگەر دەبێ و وێنەی دل لار و وێر و تاریک دەکا؛ بەلام گەر پێویست بێ و بۆ چاکە بێ و بە دل لەبەر چاوی سهێت بێ، حەرام نییە؛ چونکە گەر بێزی لێ بێ،

---

١ ـ (قورئان، ١٦/١٠٥) هەر ئەوانە درۆ بە دەم خواوە دەکەن، کەبە بەلگەکانی خودا باوەڕ ناکەن. هەر بۆ خۆشیان درۆزنن. (هـ)

٢ ـ قورئان (١٤/٢٧) خودا لە دونیا و سەلادا بە قسەی پتەو بڕواداران توندوقایم دەکاتەوە. (هـ).

بەسەر دڵدا کاریگەر نابێ و وێنەی دڵ کۆمەو نابێ و گەر بۆ کاری خێری بڵێ، دڵ تاریک نابێ. بێگومان، گەر موسوڵمانێک لە دەست ستەمکارێ هەڵبێ، نابێ بە ستەمکارەکە راستی بڵێ و دەبێ بە درۆ بیخاپێنێ و لێرەدا درۆ پێویستە. پێغەمبەر لە سێ شوێندا ئیزنی درۆی داوە: یەکەم لە شەڕدا، چونکە ناتوانی نیازی خۆت لە دوژمنت ئاشکرا کەی؛ دووەم کاتێ ویستت دووکەس پێکەوە ئاشت کەیتەوە و لە لای یەکیان لە زمانی ئەویترەوە، قسەی جوان و بەدەو کەی، هەر چەن نەیگوتبێ؛ سێهەم، ئەو کەسەی دوو ژنی هەیە و بە هەر یەکیان بڵێ تۆم زۆرتر خۆش دەوێ.

گەر ستەمکارێ لە چەندوچوونی ماڵوسامانی کەسێکی پرسی، بوی بووزدەخوا بیشارێتەوە؛ ئەگەر لەنهێنی کەسێکیتریان پرسی، رەوایە بیشارێتەوە؛ چونکە شەرع فەرموویە کارگەلی کرێت و دزێو بشارنەوە. هەروەها گەر ئافرەتێک بەبێبەڵێن بۆ مێردێ رەزا نەبوو ، رەوایە بەڵێنی پێ بدا هەرچەند بزانێ بۆی جێبەجێ ناکرێ. درۆ نابێ بوێژرێ، بەڵام کە ئەنجامی قسەی راست کارەهاتێکی نەگونجاو بوو، دەبێ بە پێوەری داد و ئینساف لە پێوانە بدرێ: ئەگەر نەبوونی ئەو شتە لە شەرعدا پێویستتر لە نەبوونی درۆیە -وەکوو دژایەتی نێوان خەڵکی، رقی ژن و پیاو لە یەک، فەوتانی ماڵوسامان، ئاشکرا بوونی نهێنی، رسوا بوون بە گوناح- ئەو دەم درۆ موباحە؛ چونکە زیانی ئەو کارە لە زیانی درۆ زۆرترە. وەکوو ئەوەی لە تەنگانەدا گۆشتی مردار حەڵالە، چونکە زیندووومان لە شەرعدا گرینگتر لە خواردنی گۆشتی مردارە. بەڵام لە کاتێکی ئاساییدا، درۆ رەوا نابێ. کەواتە، هەر درۆیەک بۆ زۆرترکردنی ماڵوسامان بێ و بە چاوڕاو و خۆهەڵکێشان و بەخۆداهەڵگوتن بێ و ئاستی بەرزی خۆی باس بکا، حەرام و نارەوایە.

ئەسما دەڵێ: «ژنێ لە پێغەمبەری پرسی "لە لای هەوەکەمەوە بە درۆ دەڵێم کە مێردەکەم چاکەی زۆری لەگەڵ کردم، تا هەوەکەم تووڕە بێ، رەوایە وابکەم یا نە؟" پەیغەمبەر فەرموی: "ئەوەی شتێک بە خۆدا هەڵببەستێ و ئەو شتە نەبێ، وەکی ئەوەیە دوو بەرگی ساختەی دەبەر کردبێ"»؛ واتە هەم خۆی درۆی گوتووە و هەمیش کەسێکی تووشی نەزانی کردووە و رەنگە ئەو کەسە ئەم درۆیە لە لای کەسیتر بگێڕێتەوە. بزانە، ئەگەر بەڵێن بە منداڵی بدەی کە دەیبەیتە قوتابخانە، رەوایە، هەرچەند کە درۆ بێ. لە خەبەردا هاتووە کە بە گوناح بۆی نانووسرێ، بەڵام ئەوەش کە رەوا بێ هەر دەنووسرێ و پاشان لێی دەپرسنەوە کە: «بۆچیت گوت؟» تا وەڵامی بداتەوە و ئەو درۆوەی بە رەوا بۆ بنووسرێ».

ئەگەر کەسێک باسێ بگێڕێتەوە یاخۆ پەرسڤی بداتەوە کە نایزانێ و هیچ ئاگای لێ نییە، ئەو کارەی نارەوایە ؛ هۆی ئەو وەرامە ئەوەبە شانوشکۆی نەشکێ.

هەندێ بە رەوایان زانیوە حەدیسی پێغەمبەر لەسەر چاک و خێر بە درو بگێڕنەوە. ئەمەش

حەرامە، چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس درۆی بۆ من هەڵبەست، بلێن لە دۆژەهدا خۆت دەبینێتەوە». چونکە درۆ تەنیا بە مەبەستێکی چاک -کە شەرع بە چاکی بزانێ- رەوایە و رەوا بوونی ئەم درۆیەش گومانی لەسەرە و لێی دڕدۆنگن و دڵنیانین. ئەوەش رەوابوونی ئاشکرا نەبێ، نە گوتنی چاترە.

**سەرنج**

گەورەکان کاتێ نیازیان بە درۆ بووبێ، فێڵیان کردووە تا پەیڤی راست بلێن و ئەو کەسە شتێکیتر تێبگا. ئەمە پێی دەڵێن «معاریض». هەروەک جاری موتەڕڕیف[1] رۆیشتە لای ئەمیرێ. گوتی: «بۆچی زۆر کەم دێیتە لامان؟» گوتی: «لەو کاتەوە لە لای ئەمیرەوە رۆیشتووم، تا ئێستا سەرم بەرز نەکردۆتەوە، بێجگە لەوەی خوا وزەی پێ دابم». ئەویش پێی وابوو کە نەخۆش بووە و قسەی ئەمیش راست بوو.

شەعبی[2] کاتێ کەسێک لەبەر دەرگا گاسی دەکرد، بە کارەکەرەی دەگوت بازنەیەک بکێشێ و ئەنگوستی لەسەر دانێ و بلێ «لێرە نییە». یا خۆ بلێ لە مزگەفتدا بۆی بگەڕە.

کاتێ مەعاز[3] گەڕایەوە لەسەر کاری حکوومەت، خێزانی گوتی: «چەن بەرانبەری عومەری خەتتاب کارت کردووە، چیت هێناوەتەوە؟» گوتی: «پاسەوانێکم لەگەڵ بوو، هیچم پێ نەهێنرایەوە»؛ واتە پەروەردگار. ژنەکەی وایزانی عومەر چاودێری بۆ داناوە. رۆیشتە لای عومەر و بە لۆمەوە پێی گوت: «مەعاز چاوساغی پێغەمبەر و ئەبووبەکر بوو، بۆچی چاودێرت بۆ داناوە؟» عومەر گاسی مەعازی کرد و لێی پرسی. کە بۆی گێرایەوە، بزەیکی کرد و شتێکی پێدا بیباتەوە بۆ خێزانی.

بزانە، ئەمەش کاتێ رەوایە، کە نیاز بێ؛ بەلام کە پێویست نەبوو و خەڵکی تووشی لێلی کرد، ناڕەوایە، هەر چەن راست بێ. عەبدوڵلای کوڕی عەنەبە دەڵێ: دەگەڵ بابم بۆ سەردانی عومەری عەبدولعەزیز رۆیشتین. کە هاتمەدەر بەرگێکی جوانم لەبەر بوو. خەڵکی گوتیان: «ئەمە دیاری ئەمیرەلمۆئمینەنە؟» گوتم: «پەروەرندەم پاداشی خێر بداتە ئەمیر!» بابم گوتی: «رۆڵە! ئامان نە درۆ بلێ و نە وەکوو درۆ»؛ واتە ئەم وتەیە وەکوو درۆ بوو. بەلام بۆ دڵخۆشکردن یا خۆ دڵدانەوەی کەسێک رەوایە. هەر وەکوو پەیغەمبەر بە پیرەژنێکی گوت: «پیرەژن ناڕۆنە بەهەشت»، «لەسەر

---

[1] ـ مطرف: «مطرف بن عبدالله بن الخیر» (لە ٨٧ کۆچی کردووە) لە تابعین و پارێزکارانی گەورەیە.
[2] ـ مەبەست «عامر بن شرامیل» ە (١٩ـ١٠٣) لە تابعین بوو.
[3] ـ معاذ بن جبل.

بەچکە حوشترت سوارکەم»، «لە چاوی مێردت سپیایی هەیە». بەڵام ئەگەر زیانێکی تێدا بێ نارەوایە. هەر وەکوو ئەوەی کەسێ بخەنە بن گۆم[1] و پێی بڵێن «ژنێ حەزی لێتە» تا بیری لێ بکاتەوە و شتی ئاوەها. بەڵام گەر زیانی بۆ کەسێ نەبێ و تەنیا بە مەبەستی پێکەنین درۆ بوێژرێ، گوناح نییە، کەچی ئاستی بڕوای نزم دەبێتەوە.

پەیغەمبەر فەرمووی: «باوەڕی مرۆڤ تەواو نابێ مەگین ئەو شتەی بۆ خۆی پەسندی دەکا، بۆ خەڵکیشی پەسندی کاو لە گاڵتەدا درۆ نەکا». گەر بۆ دڵخۆشی کەسێک بوێژرێ «سەد جار هاتم بە دووتا و نەبووی»، ئەمە حەرام نییە، چونکە لێرە مەبەست ژمارە نییە، بەڵکوو مەبەست زۆر پشکنینە، هەر چەن ئەوەندەش نەبێ، بەڵام نابێتە حەرام. بەڵام ئەگەر زۆری بە دوودا نەگەڕابێ، درۆیە.

ئەمەی کە لە نێو خەڵکدا بۆتە باو و دەڵێن شتێک بخۆ، دەڵێ پێم ناخورێ، نارەوایە، چونکە ئارەزووی خواردنی لە دڵدایە.

شەوی زەماوەندی عایشە، پەیغەمبەر پەرداخی شیری دا بە ژنان. گوتیان: «پێمان ناخورێ». فەرمووی: «درۆ و برسیەتی پێکڕا کۆوە مەکەن». گوتیان: «پێغەمبەر! ئەم رادەیەش درۆیە». فەرمووی: «ئەمە درۆیەکی بچووکە و درۆیەکی بچووکیش دەنووسرێ».

سەعیدی موسەییێب چاوی نشتبووە ژان. لە بیلبیلەی چاویدا شتێ کۆوە ببوو. گوتیان ئەگەر بە دەست بیسڕی چییە؟ گوتی بە پزیشکم گوتووە دەست لە چاوم نادەم؛ ئەگەر بیسڕم تووشی درۆ دەبم.

عیسا دەیگوت: «لە گوناحانی گەورە ئەوەیە کە خوا لەسەر درۆ بە شایەت بگرن و بڵێن "خوا دەزانێ وایە" کەچی واش نەبێ».

پەیغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس خەونی درۆ بگێڕێتەوە، لە رۆژی پەسلاندا دەبێ دانەی جۆ گرێ بدا».

**ئافەتی دوازدەهەم**، خوسپەیە و ئەمەش بەسەر زاراندا زاڵە و کەس تا خوای نەیەوێ لێی قوتار نابێ. گوناحی ئەمەش ئێجگار گەورەیە و پەروەردگار لە قورئاندا چواندوویە بەو کەسەی کە گۆشتی برای مردووی دەخوا. پەیغەمبەر فەرمووی: «لە خوسپەو پاشملە خوێندنی خەڵک خۆ بپارێزن، چونکە خوسپە لە زینا خراپترە؛ ئەوەی لە زینا پاشگەز بێتەوە خوا دەیبوورێ، بەڵام لە خوسپە نابوورێ، مەگین ئەوەی ئەو کەسەی خوسپەی کراوە، گەردنی ئازاد کا». دیسان فەرمووی: «لە شەوی سەفەرم بۆ ئاسمان تاقمێکم بینی کە بە نینۆک رووی خۆیان دەرنی. گوتم ئەمانە کێن؟ گوتیان: ئەو

---

[1] ـ کەسێ خستنە بن گۆم: کەسێک فریودان، سەر لە کەسێک شێواندن.

کەسانەن کە لە پاشملەی خەڵکی دواون».

سلەیمان کوڕی جابر گوتی: «بە پێغەمبەرم گوت: شتێکم پێ فێر کە لە دوارۆژدا دەستم بگرێ. فەرمووی: کاری چاکە بە سووک مەگرە؛ ئەگەر ئەوەندەش بێ کە لە مەشکەی خۆت چۆڕێ ئاو بکەیتە نێو گۆزەی کەسێک؛ هەروەها دەگەڵ برایانی موسوڵمانت رووخۆش بەو کە لێک جیابوونەوە خوسپەی مەکە».

پەروەردگار بە مووسای گوت: «ئەوەی لە خوسپە پاشگەز بێ و بمرێ، دوایین کەسە کە دەڕواتە بەهەشت؛ ئەگەر پاشگەز نەبوو و مرد، یەکەم کەسە دەڕواتە جەحەنەم».

جابر دەڵێ: دەگەڵ پەیغەمبەر لە سەفەردا بووین. ڕێمان کەوتە سەر دوو گۆڕ. فەرمووی: «ئەم دووانە ئازار دەدرێن، یەکیان بە بۆنەی خوسپەوە و یەکیان بەبۆنەی ڕانەگرتنی جلوبەرگی لە پیسایی». پاشان دارێکی تەڕی کردە دوو لەت و لەسەر قەبری هەردوویانی ڕۆ کرد و فەرمووی تا ئەم دوو دارە تەڕ بن، ئازاری ئەم دووانە کەمتر دەبێ.

زەلامێ هاتەدەنگ و دانی بەزینای خۆیدا نا، فەرمانی سەنگساری بۆ درا. یەکێک بە یەکێکی‌تری گوت: «چۆن سەگ ڕادەنێن ئەویش هەروا ڕادەنێن». پەیغەمبەر گوێی لێ بوو؛ بەسەر لاشەی مردارێکدا تێپەڕا، فەرمووی: «لەم مردارە بخۆن». گوتیان: «چۆن دەبێتن مردار بخۆین؟» فەرمووی: «ئەوەی لە گۆشتی ئەو براتانە دەیخۆن، پیستر و خراپتر لەم مردارەیە». ئەمەی هەم بە بێژەر و هەم بە بیسەر گوت؛ چونکە بیسەریش هاوبەشە لەم گوناحەدا.

یارانی پەیغەمبەر بە ڕووی گەشەوە سەردانی یەکیان دەکرد و خوسپەی یەکیان نەدەکرد و ئەمەیان لە هێژاترینی عیبادەتەکان دەزانی و بێجگە لەمەیان بە دوڕازی و دوڕوویی دەزانی.

قتادە دەڵێ: «ئازاری گۆڕ سێ پاژە: یەکیان هی خوسپەیە و یەکیان قسەهێنان و بردن و یەکیان هی ئەوانەیە بەرگیان لە پیسایی ناپارێزن».

عیسا لەگەڵ یارانی ڕادەبوردن، سەگێکی تۆپیویان بینی. گوتیان: «چ بۆنێکی پیسی هەیە!» عیسا گوتی: «ددانی چەن سپی و جوانە و خوسپە لەو مردارە پیسترە». وای ڕاهێنان کە هەرچی دەبینن، باس لە جوانی و چاکییەکەی بکەن.

بەرازێ بە تەنشت عیسادا ڕابورد. عیسا گوتی: «بڕۆ، بەخێرچی!» گوتیان: «ئەی ڕۆحی خودا! بۆچی وا لەگەڵ بەراز ئاخاوتی؟» گوتی: «زارم بێجگە لە خێر و چاکە بە شتێکی‌تر ڕاناهێنم».

عەلی کوڕی حوسەین زەلامێکی دی کە خوسپەی دەکرد. گوتی: «وس بە! چونکە ئەمە پێخۆری سەگانی دۆژەهە».

**سەرنج**

بزانە، خوسپە ئەوەیە کە باسی کەسێک بکەی لە پاشەملەی و ئەگەر خۆی بیژنەوێ زیز و زویر بێ؛ هەرچەند راستت گوتبێ، دیسان خوسپەیە. بەلام گەر بە درۆ گوتبێتت، ئەوە بوختان و هەلبەستراوە. هەر پەیڤێ بگەڕێتەوە بۆ باس لە کەمایەسی کەسێک، خوسپەیە؛ هەرچەن ئەو باسە باسی رەگ و تۆرەمەو پلە و پاگە و باسی ئاژەل و چوارپێ و خانی و هەلسوکەوتی وی بێ؛ وەکوو ئەوەی لە باسی لەشدا بلێی: درێژە، رەشە، زەردە و پشیلە چاوە و خوێلە؛ یان لە باسی تۆرەمەدا بلێی: لە تۆرەمەی هیندووە، حەجامەتکەرە، جۆلایە؛ لەسەر ئاکاری بلێی: ئاکارنزمە، لووتبەرزە، بێنوێژە، رکووع و سوجدەی ناتەواوە، قورئان بە هەلە دەخوێنێ و جلکی پاکژ نییە و زەکات نادا و حەرام دەخوا و زمان ناپارێزێ و زۆر دەخوا و زۆر دەخەوێ و لە سەرجێێ خۆی رۆنانیشێ؛ یان لە باسی پۆشەنیدا بلێی: داوێن شۆڕە. بە گشتی هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «هەر پەیڤێ کە لای کەسێکەوە بیلێی و ئەو کەسە زویر بێ، گوتنی لە پشت سەریەوە دەبێتە خوسپە؛ هەرچەند راستیش بێ».

عایشە دەلێ: «ژنێکم دی، گوتم بالای زۆر کورتە. پەیغەمبەر فەرمووی: خوسپەت کرد، تف کەرەوە. تفم کردەوە؛ پارچە خوێنێکم لە دەم داکەوت. فەرمووی: سەد جار داوای لێبۆردن کە و لەو ژنە گەردن ئازادی بخوازە».

تاقمێ گوتوویانە: «گەر کەسێک گوناحێکی کرد و باسی کرا، نابێتە خوسپە؛ چونکە ئەو لۆمەیە کارێکی شەرعی و دینیە». ئەمە هەلەیە. تەنانەت نابێ بلێن فلانکەس داوێن پیس و خراپکار و شەرابخۆر و نەکەنمازە، مەگین بە هۆیەک کە پاشان دەبێژرێ. چونکە پەیغەمبەر خوسپەی بەوە زانیوە کە ئەو کەسە گەر خۆی بیژنەفێ، پێی ناخۆش بێ. هەروەها چونکە لەم پەیڤانەدا هیچ قازانجێک نییە، نابێ بوێژرێن.

**سەرنج**

بزانە خوسپە تەنیا بە گوتن نییە، بەلکوو بە چاو و هێما و دەست و نووسینیش هەر حەرامە. عایشە دەلێ: «بە دەست هێمام بە ژنێک کرد کە کورتە بالایە. پەیغەمبەر گوتی خوسپەیە». هەروەها لارە لارە رۆیشتن، یا چاو خوێل کردن بۆ گوتنی چۆنییەتی کەسێک، ئەوەش خوسپەیە. بەلام گەر بەبێ ئاشکراکردنی ناوی کەسێک بلێی: «یەکێک وای کرد» ئەوە خوسپە نییە، مەگین ئەوەی دانشتووان پێدابگرن کە کێ دەلێی، ئەو سا حەرامە. تاقمێ لە قورئانخوێنان و پارێزکارانی

گێل و نەزان، خوسپە دەکەن، کەچی لایان وایە لە پاشملەی کەس نەدواون؛ وەکوو ئەوەی باسی کەسێ لە لای خەڵک دەکەن و دەڵێن: «سپاس بو خودا! کە ئێمەی پاراستووە لە فلان شت»، تا بزانن کە ئەو کەسە وای کردووە یا خۆ دەڵێن: «فلانکەس پیاوی چاکە، بەلام بەداخەوە ئەویش بە دەردی خەڵک چووە، وەکوو ئێمە کە تووشیارین؛ کێ لە هەڵە و گوناح رزگاری هەیە؟» تەنانەت رەنگە لۆمەی خۆ بکەن تا بەو چەشنە لۆمەی کەسیتریان کردبێ.

رەنگە لە لایان خوسپەکەن و ئەمان بلێن: «سُبْحانَ اللّه! چەندە سەیرە!» تا ئەو کەسە لەسەر باسەکەی سوورتر بێ و ئەو کەسانە لە کۆڕەکەن و گوێیان لێ نەبووە، ئاگادار بنەوە؛ هەروەها دەڵێ: «زۆر خەمبار بووم کە فلانکەس واتووش بووە، خوا بەزەیی پێیدا بێتەوە!» مەبەستی لەم وتەیە ئاگادار کردنەوەی کەسانیترە. یاخۆ رەنگە کاتێ باسی کەسێ دەکرێ، بلێ: «لەو گوناحانە پاشگەز دەبمەوە بەرەولای خودا!» تا بزانن کابرا گوناحی کردووە. ئەمانە هەمووی خوسپە و غەیبەتن؛ بەلام چونکە وایە، دوڕوویشی تێکەڵە، چونکە خۆی بە پیاوچاک و پارێزکار پیشان داوە؛ بۆیە گوناحەکانی بوونەتە دوان، کابراش بە پێی گێلیەکەی وا دەزانێ خوسپەی نەکردووە. رەنگە کەسێک لە لای خوسپە کاو ئەمیش بلێ: «وس بە! خوسپە مەکە!» بەلام لە دڵدا بە دزیوی نەزانێ؛ کەواتە، هەم دوڕاز بووە و هەمیش خوسپەکەر؛ چونکە ئەوەی گوێ بۆ غەیبەت راگرێ، لەگەڵ ئەوەی خوسپە دەکا، وەکوو یەکن، مەگین ئەوەی بە دڵ لە لای کرێت بێ. رۆژێ ئەبووبەکر و عومەر پێکڕا دەڕۆیشتن. یەکیان گوتی: «فلانکەس زۆر دەنوێ». کە گەیشتنە لای پەیغەمبەر، داوای خواردنیان کرد. پەیغەمبەر فەرمووی: «ئەنگۆ نانتان خوارد». گوتیان: «نازانین چیمان خواردووە». فەرمووی: «گۆشتی براکەتان خوارد». بە هەر دوویانی گوت؛ چونکە یەکیان گوتبووی، ئەویتر گوێی بۆ راگرتبوو. هەروەها ئەگەر کەسێک بە دڵ خوسپەی لا سهێت بێ و بە چاو یا دەست ئاماژە کات کە بێدەنگ بە، هێشتا کۆتایی کردووە: دەبێ پاک و پاراو و بێگرێ و گۆڵ و بەڕاشکاوی بلێ وس بەو خوسپە مەکە، تا تووشی گوناح نەبێ و لە برای خۆی پشتگیری کردبێ. چونکە لە خەبەردا هاتووە کە هەرکەس خوسپەی برای موسوڵمانی کەن و ئەم لایەنگری لێ نەکاو پشتی خالی کا، پەوەردگار لەو رۆژەدا کە ئەم نیازی بە یارمەتییە، لێی ناپرسێ.

### سەرنج

بزانە خوسپەی بە دڵ، وەکوو زمان حەرامە؛ هەروەک ئیزنی ئەوەت نییە باسی کەمایەسی کەسێک بۆ کەسێک بگێڕیتەوە، بۆ خۆشت نابێ بیلێیتەوە. خوسپە بە دڵ ئەوەیە کە گومانی خراپە بەیت لە کەسێ بە بێ ئەوەی شتێک بە چاو ببینی یا بە گوێ ببیسی یا خۆ لێی ئارخەیان بی.

پێغەمبەر فەرمووی: پەروەردگار خوان و سامان وماڵی موسوڵمانان و هەروەها دڕدۆنگ بوون لە موسوڵمانی حەرام کردووە.

هەرچی بە دڵدا بێ، کەچی نە لێی دڵنیا بێ و نە دوو زەلامی دادوەر گوتبێتیان، شەیتان خستۆتیە دڵیەوە. پەروەردگار دەڵێ: إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟[1]، پەیڤی خراپکار باوەڕ مەکەن؛ جا خۆ هیچ خراپکارێ ناگاتە قولەپێی شەیتانا. حەرام ئەوەیە کە دڵی پێ بسپێرن. بەڵام بیرێک کە بۆ خۆی بە مێشکدا تێپەڕێ، نابێتە هۆی گوناحباری و لێپرسینەوە؛ چونکە پەیغەمبەر فەرمووی بڕوادار لە گومانی خراپ دەربازبوونی بۆ نییە، بەڵام گەر متمانە بەو گومان نەکا گوناحبار نابێ، تا بۆی بووز بخوا چاتر وایە بە چاکە بیری لێ بکاتەوە. نیشانەی ئەوەی کە باوەڕی بەو گومانە خراپە هێناوە ئەوەیە کە ئەو کەسەی لەبەر چاو ڕەزاگران دەبێ و بە سووکی سەیری دەکا؛ بەڵام گەر بە دڵ و بە زمان و بەهەڵس‌وکەوت وەکوو جاران بێ، دیارە باوەڕی بەو گومانە خراپە نەکردووە. بەڵام گەر لە دادگەرێکی بیست، دەبێ رامێنێ و بە درۆزنی نەزانێ، چونکە دڕدۆنگ بوون لە دادگەر ناڕەوایە، تەنانەت لە خراپکاریش ناڕەوایە، بەڵام دەبێ بڵێت: «بارودۆخی ئەم پیاوەم لێ بەرپیوارە، وەکوو بارودۆخی ئەو زەلامە ئێستا لێم نادیارە». ئەگەر زانی نێوانی ئەم دوو کەسە ناکۆکە، دەبێ بەر لە باوەڕکردن، رامێنێ. هەروەها گەر یەکێکیانی بە راستتر زانی، زۆر بڕوا بەو یەکەیان کا. هەرگا لە یەکێکیان دڕدۆنگتر بوو، باشتر وایە زۆرتر توخنی بکەوێ، چونکە شەیتان لەو کارەی زۆر تووڕە دەبێ و ئەو دڕدۆنگییەی کەم دەبێتەوە. کە دڵنیا بوو لە راستی ئەو هەواڵە، نابێ غەیبەتی کات، بەڵام دەبێ لە تەنیاییدا مۆچیاری کا. لە ئامۆژگاریدا نابێ لووت‌بەرز بێ؛ بەڵکوو دەبێ کاتی ئامۆژگاری خەمبار بێ، تا هەم بە بۆنەی هەڵەی موسوڵمانێکی‌ترەوە خەمبار بێ، هەمیش ئامۆژگاری کردبێ و پاداشی هەردووکیانی وەبەرکەوێ.

**سەرنج**

بزانە حەز بە خوسپە، نەخۆشییەکی دڵەو دەرمانی پێویستە و بە دوو جۆرە:

**دەرمانی یەکەم** زانستیە و ئەوەش بە دوو جۆرە:

**یەکەم،** با لەو خەبەرانەی لەسەر خوسپە بێژراون، رامێنێ و بزانێ هەر غەیبەتێ کە دەیڵێ چاکەیەک لە نامەی کردەوەکانی ئەم دەسڕنەوەو لەویتری زیاد دەکەن، بۆیە بێ کردەوە دەمێنێتەوە؛ پێغەمبەر فەرمووی: «خوسپە چاکەکان وا دەفەوتێنێ کە ئاور هێزمی وشک». رەنگە ئەو کەسە پتر لە چاکەیەکی نەبێ و هەرچی کردەوەی هەیە خراپە بێ؛ بەم خوسپەیە تای

---

١ ـ قورئان، ٦/٤٩.

گوناحەکانی قورستر دەبێ و دۆژەهی لێ نزیکتر دەبێ.

**دووەم،** بیر لە کەمایەسی خۆی کاتەوە: گەر کەم و کورتیەکی لە خۆدا بینی، بزانێ ئەو کەسەش لەو کەمایەسیەدا وەکوو خۆی بێدەسەلاتە؛ بەلام گەر هیچ کەم و کووڕیەکی لە خۆدا نەدی، بزانێ کە هۆی نەزانی و بێئاگایی لە خۆیەو ئەوەش گەورەترین کەمایەسییە کە مرۆ لە خۆی باش نەگەیبێ. بەلام ئەگەر بە راست هیچ کەموکووڕیەک لە خۆیدا بەدی نەکا دەی خۆ هیچ نوقسانێ زۆرتر و خراپتر لە خواردنی گۆشتی مردوو نییە؛ دەسا بۆ چی خۆی -کە بێکەمایەسییە- تووشی هەڵەو کەم و کورتی کا؟ دەبێ خەریکی سپاسی خودا بێ و چاک بزانێ گەر خەریکی باسی هەڵەی هێلی لاری کەسێکە، هیچ کەس لە هەڵەو پەڵەیە بێبەش نییە. هەروەها کە خۆی لەسەر هێلی شەرع کلا دەبێ -هەر چەن بە گوناحی بچووک- چۆن دەتوانێ چاوەنۆڕ بێ کەسیتر کلا نەبێ. یاخۆ گەر لە ئافراندنیدا نوقسانێ هەیە، بزانێ ئەو کەمایەسییە پەروەردگار چێی کردووەو بە دەستی خۆی نییە تا لۆمەی بکرێ.

بەلام **دەرمان بەلێکدانەوە راڤە کردن** ئەوەیە کە دەبێ رابمێنێ تا بزانێ چ شتە دەبێتە هۆی خوسپە کردن؛ ئەوەش هەشت شتە:

**یەکەم** ئەوەیە کە بە هۆی شتێکەوە لە کەسێ تووڕە بێ. دەبێ تێبگا کە بە بۆنەی زویر بوون لە کەسێک، خۆ تووشیاری دۆژەهـ کردن بەلگەی گێلییە؛ چونکە ئەمە دوژمنایەتی لەگەڵ خۆ کردنە، نەک کەسیتر. پەیغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی تووڕەیی خۆی نەدرکێنێ، پەروەردگار لە رۆژی پەسلاندا لە پێش هەمووان گاسی دەکا و پێی دەلێ: "هەرچی پێت خۆشە لە حوورییەکانی بەهەشت، هەلبژێرە"».

**دووەم** ئەوەیە پەیڤی کەسانیتر ببیسێ و دانی پێدا بنێ تا لێی خۆش بن و خۆشیان بوێ. دەرمانی ئەمەش زانینی ئەوەیە کە بەبۆنەی رەزامەندی خەلکەوە دوژمنایەتی خودا کڕین، گێلی و گەوجییە؛ بەلکوو دەبێ بە پێچەوانەی ئەمە، رەزامەندی خودا بکڕێ هەرچەند ببێتە هۆی تووڕەبوون و زیز بوونی کەسانیتر.

**سێهەم،** بە بۆنەی تاوانێکەوە قولبەست کرابێ و ئەمیش بۆ دەربازبوون لەو گرفتە، تاوانەکەی بخاتە ئەستۆی کەسێکی دی. دەبێ بزانێ بەلای تووڕەبوونی پەروەردگار -بێگومان- ئێجگار مەزنترە لەو تووش بوونەی دەیەوێ لێی دەرباز بێ؛ چونکە رەنگە بتوانێ دەرباز بێ، کەچی پەروەردگار لێی تووڕە دەبێ: دەبێ خۆی دەرباز کا، بەلام نەیخاتە ئەستۆی کەسیدی.

رەنگە بلێ: «هەر چەندە من حەرام دەخۆم، یا پارەی سولتان وەردەگرم، بەلام خۆ فلانکەسیش وادەکا»، ئەمە نەفامییە؛ چونکە بۆ گوناح نابێ پێڕەوی لە کەس بکرێ. ئەم بیانووە چت بۆ دەکا؟

ئەگەر کەسێک ببینی دەڕواتە نێو ئاگرەوە، تۆش ناکەویتە دووی، چاولێبڕین بۆ گوناحکردن ئاوەهایە.
کەوابوو بۆچی بۆ پاکانەیەکی نابەجێ، دەبێ خۆت تووشیاری گوناحێکیتر کەیت و خوسپە بکەی؟

**چوارەم،** ئەوەیە کە کەسێک پێی خۆشە پەسنی خۆ بکا و بە خۆیدا هەڵبڵێ، بەڵام پێی نەکرێ و لەرووی هەڵنەیێ تاریفی خۆی بکات، بۆیە خوسپەی کەسیتر دەکا تا هێژایی و پاکی خۆی بنوێنێ. هەروەک دەڵێ: «فلانکەس، هیچ نازانی؛ فلانکەس خۆی لە ژنان ناپارێزێ»؛ واتە: من زۆر دەزانم؛ لە ژنان خۆم دەپارێزم. دەبێ بزانێ ئەوەی ژیر و تێگەیشتوو بێ و گوێ لە وتەکانی بگرێ، گێلی و گەوجی و داوێنپیسی ئەو کەسەی بۆ دەسەلمێ، نەک ژیری و زانست و وریایی و پارێزکاری؛ ئەوەش گێل و نەفام بێ، بیر و بۆچوونی چ قازانجێکی هەیە؛ هەروەها بەم کارەی شانی خۆی لە لای پەروەرندەی کەم دەکا تا لە لای بەندەیەکی بێ دەسەڵاتی بێئەنوا خۆی بەرزکاتەوە.

**پێنجەم،** ئێرەیی بردنە؛ واتە کەسێک خێوی پلە و پاگە و زانست و ماڵوسامان و ناو و دەنگی بەرز بێ و خەڵکی سەری پێبسپێرن، بەڵام ئەم چاوی لە بەرانبەر ئەو مێرخاسییە هەڵنەیێ: کەمایەسییەکانی دەپشکنێ تا لەگەڵی دژایەتی کردبێ. ئەم کەسە نازانێ ئەم دژایەتییەی لەل خۆ کردووە: چونکە لەم دونیایەدا لە نێو ئاوری ئێرەییدا دەسووتێ و لەو جیهانیش تووشی سزای خوسپە دەبێ و هەم ئەم دونیای دەفەوتێ و هەم ئەو دونیای؛ هەروەها لەوەش بێ ئاگایە کە هەرکەس شانوشکۆیەکی پێ درابێ، ئێرەییبردنی چاوچنۆکان، ئەو پلە و پاگەیە بەرزتر دەکاتەوە.

**شەشەم،** قەشمەری[1] کردن بە کەسێکیترە بۆ گاڵتەو کەنین و یاری و سووکایەتی بە کەسانیتر. نازانێ، ئەوەی دەیەوێ کەسێ لە لای خەڵکی سووک و بێنرخ کا، سەرەتا خۆی لە لای خودا بێ نرخ و پووچ دەکا. جا ئەگەر چاک بیری لێ بکاتەوەو ببینێ لە رۆژی پەسڵاندا ئەو کەسە گوناحەکانی خۆی لە کۆڵی ئەم ناوە و وەکوو وڵاخ وەبەر خۆی ناوە و لێی دەخوڕێ و بەرەو دۆژەهی دەبا، دەزانی کە خۆی زۆرتر شیاوی گاڵتە و جەفەنگ و قەشمەرییە. جا کەسی برای! ئەوەی بزانێ وای بەسەردێ، گەر ژیر و تێگەیشتووبێ، کەی خەریکی یاری و پێکەنین دەبێ.

**حەوتەم،** ئەوەیە کە برادەرێکی تووشی گوناح بێ و ئەمیش لە بۆ رەزای خودا و وەکی رەوشتی دینداران، لە گوناحباری برادەرەکەی زیز و زویر و خەمبار دەبێ و لەم کاتەدا کە ئەم باسە دەگێڕێتەوە، لەپڕونەکاو، بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بێ، ناوی ئەو کەسە دەباتن، بە بێ ئەوەی بزانێ تووشی خوسپەی ئەو کەسە بووە و نەزانێ کە شەیتان ئێرەیی پێ بردووە کە دیویە ئەم بەم خەمخواردنەی پاداشی بەردەکەوێ، بۆیە ناوی ئەو کەسەی بەسەر زاریدا هێناوە، تا تووشی خوسپە بێ و ئەو پاداشەی بفەوتێ.

---

١- قەشمەر: گاڵتەجاڕ.

**هەشتەم**، ئەوەیە کە لە گوناحباربوونی کەسێکی دی -بۆ ڕەزای خودا- تووڕە بێ و پێی سەیر بێ کە چلۆن ئاوەها تووش بووە. لەو سەرسووڕمان و تووڕەییەدا ناوی ئەو کەسە ببات و خەڵک بیناسن و پاداشی تووڕە بوونەکەی بفەوتێ؛ چونکە دەبێ باسی تووڕەبوونەکەی بکا، بەڵام نابێ ناوی کەس ببا.

**شرۆڤەی ئیزن بۆ خوسپە کردن**

خوسپەش وەکوو درۆ حەرامە، مەگەر بۆ نیازێکی ڕەوا. ئەوەش شەش نیازە:

**یەکەم**، دادخواستن لە لای پادشا و دادوەر یاخۆ هەرکەسێک کە یارمەتی بدات، ڕەوایە. بەڵام ستەم لێکراو نابێ لە لای کەسێک کە هیچ قازانجی پێ ناگەینێ، باس و خوسپەی ستەمکار بکا. یەکێک لە لای ئیبنیسیرین زولمی حەجاجی[1] دەگێڕایەوە. گوتی: «خوای گەورە دادی حەجاج لەو کەسەی خوسپەی دەکا بەو چەشنە بسێنێ کە دادی خەڵکی لە حەجاج».

**دووەم**، ئەوەیە کە گەر لە شوێنێکدا خراپەیەکی بینی، بۆ کەسێک کە پێی بکرێ چاری ئەو خراپە کا، بیگێڕێتەوە. عومەر لە لای تەلحە [یان عوسمان] تێپەڕی؛ سڵاوی لێکرد؛ بەڵام ئەو وەرامی نەدایەوە. لەلای ئەبووبەکر گلەیی کرد و بۆی گێڕایەوە تا لێی بپرسێ، ئەمەیان بە خوسپە نەدەزانی.

**سێهەم**، پرسینی فتوا، وەکوو ئەوەی بڵێ: «ژن، یان باب، یاخۆ فلانکەس وام بەسەر دێنێ»، چاتر وایە بڵێت: «چ دەڵێی ئەگەر کەسێک وا بەسەر کەسیتر دا بێنێ؟» بەڵام گەر ناویش بەرێ، ڕەوایە؛ چونکە ڕەنگە مفتی ڕاستی زۆرتری لێ ئاشکرا بێ و ڕێگەچارەیەکی باشتر ببینێتەوە. هێنت لە پەیغەمبەری پرسی: «ئەبووسوفیان پیاوێکی ڕژدە، خەرجی خۆم و منداڵەکانم نادات؛ گەر بەبێ ئیزنی ئەو، بە قەدەر نیازی خۆم و منداڵەکانم هەڵگرم ڕەوایە یان نە؟» فەرمووی: «بە قەدەر نیازتان هەڵگرە و زۆرتر نە». باس لە زوڵم لە منداڵان و ڕژدی پیاو، خوسپەیە؛ بەڵام بە بۆنەی فتوا خواستنەوە پەیغەمبەر بە ڕەوای زانی و ئیزنی داوە.

**چوارەم**، باسی کەسێک کە خەڵک لە نەناسینی تووشی زیان بن؛ وەکوو ئەوەی کەسێک دز یا خۆ داهێنەر (مبتدع) بێ و خەڵکی باوەڕیان پێ هەبێ یاخۆ ژنی پێ بدەن، یاخۆ بەندەیەکی پێ بفرۆشن و گەر ئەم کەمایەسییەکانی نەڵێ، خەڵک زیانبار بن. ئاشکراکردنی ئەم کەمایەسییە چاترە و شاردنەوەی زەغەڵ و گوناحە لە ئاستی موسوڵمانانذا.

«مُزَکّی»[2] بۆی هەیە ڕەخنە لە شایەت و خوسپەکە بگرێ؛ هەروەها لەو کەسەی کە ڕاوێژی

---

[1] - حەجاج کوڕی یووسف.

[2] - ئەوەی کە پاک و دادوەربوونی شایەتەکان دەسەلمێنێ.

دەگەڵ دەکا. پێغەمبەر فەرمووی: «خراپکار، هەر کەمایەسییەکی هەیە ئاشکرای کەن تا خەڵکی خۆیان لێ بپارێزن». ئەمە کاتێ سوننەتە کە مەترسی بەلا هەبێ؛ بەلام گەر وانەبوو رەوا نییە. دەڵێن باسی سێ کەس نابێتە خوسپە: پادشای ستەمکار، داهێنەر (متبدع)، ئەوەی بە راشکاوی خراپە بکا. هۆکەشی ئەوەیە ئەم تاقمە خراپەکانیان ناشارنەوە و گەر کەسێک باسیان بکات هیچ زیز نابن.

**پێنجەم،** ئەوەیە کە کەسێک بە نیتکەیەک ناوبانگی دەرکردبێ، وەکوو کوێر و شەل. بەلام چونکە بەو ناوە دەناسرێ، لێی زیز نابێ. بەلام چاکتر وایە کە بە ناوێکیتر گاسی بکا؛ وەکوو بە کوێر بلێ «دڵڕوون» یان «دڵبین».

**شەشەم،** ئەوەی بە راشکاوی خراپە بکا، وەکوو مێرمەندۆک[1]، شەراوخۆر و ئەو کەسانەی لە کاری خراپ شەرم ناکەن: باسی ئەمانە رەوایە.

**کەفارەی خوسپە،** پاشگەزبوونەوە لەو گوناحەیە و تکا و لاڵەیە لە لای پەروەردگار تا واز لە سزادانی بێنێ و پاشان دەبێ لە لای ئەو کەسەی خوسپە کراوە، داوای لێبۆردن و گەردن ئازایی بکا، تا لە ئۆبالی ئەویش رزگاری بێ. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس ستەمی لە ماڵ یا خۆ ئاوڕووی کەسێک کردووە، دەبێ داوای لێبوردنی لێ کا، بەرلەوەی رۆژێ بگا کە نە درهەمی بێ و نە دینار: بە ناچار لە چاکەکانی کەم دەکەن و لە هی ئەویتری زۆر دەکەن؛ گەر هیچ چاکەیەکی نەبوو، لە گوناحەکانی ئەو دەخەنە سەر گوناحەکانی».

عایشە بە ژنێکی گوت: «زمان درێژە»، پێغەمبەر فەرمووی: «خوسپەت کرد، داوای لێبۆردنی لێ کە». لە خەبەردا هاتووە کە هەرکەس خوسپەی کەسێکی کرد، دەبێ لە پەروەردگار داوای لێخۆشبوونی بۆ کا؛ تاقمێ لایان وابوو کە هەر ئەم تکایە بەسە و نایەوێ داوای لێبۆردنی لێ کەن؛ کەچی بە گوێرەی خەبەرەکانیتر، ئەم بۆچوونە هەڵەیە. ئەم تکا بۆ لێبۆردنە بۆ ئەو کەسانەیە کە مردوون و هیچ دەستی پێیان راناکا، بێجگە لەوەی لە لای پەروەردگار بۆ بەختەوەری دوارۆژیان بپارێتەوە.

بەلام گەردن ئازای و تکا بۆ لێبۆردن ئەوەیە کە ملکەچ و پەشیوان بڕواتە لای و پێی بلێ: «هەڵەم کرد و درۆم گوت؛ بمبوورە» گەر گەردنی ئازاد نەکرد، دەبێ بە چاکە باسی بکاو پەسنی بلێ و بیدوێنێ و دڵی خۆش کا، تا بیبووری.

ئەگەر نەیبووری، مافی خۆیە، هەرچەند ئەو رێزگرتنانەی بۆ بە چاکە دەنووسن. رەنگە لە رۆژی پەسلاندا بە جێی گوناحی خوسپە بۆی بنووسرێ. بەلام باشتر لێبووردن و گەردن ئازاد کردنە.

---

[1] - مێرمەندۆک: نە نێرە نە مێ، نحنێ.

هەندێ لە پێشووونان گەردنیان ئازاد نەکردووە و گوتوویانە «لە دیوانی ئێمەدا هیچ چاکەیەک گەورەتر لەمە نییە»؛ بەڵام لە ڕاستیدا لێبوردن چاکەیەکی هێژاتر و گەورەترە. کابرایەک خوسپەی حەسەنی بەسری کرد. تەبەقێک خورمای بە دیاری بۆ نارد و گوتی: «ژنەفتم عیبادەتەکانی خۆتت بە دیاری بە من بەخشیوە و منیش ویستم سپاست بکەم ئەم تەبەقە خورمایەم بە دیاری بۆت نارد. دەبێ بمبووری کە نەمتوانیوە بە تەواوی قەرەوی چاکەت کەمەوە».

بۆ داوای لێبوردن‌کردن، دەبێ بە تەواوی پێی بڵێ چی گوتووە؛ چونکە بێزار بوون بابەتی لێڵ و نادیار دروست نییە.

**ئافەتی سێزدەهەم،** دوو زمانی و تێچێنیە.

پەروەردگار دەڵێ: هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ[1] یاخۆ وَيۡلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ[2] هەروەها دەڵێ: حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ[3] مەبەستی لە هەموو ئەمانە دوو زمانییە.

پێغەمبەر فەرمووی: «دوزوان ناچێتە بەهەشت». هەروەها گوتی: «ئاگادارتان دەکەمەوە کە خراپترینی ئەنگۆ کێیە: ئەوانەی لە نێوان خەڵکدا دوزوانی دەکەن و نێوانی خەڵکی تێک دەدەن، خەڵکی بە گژی یەکدا دەدەن». هەروەها گوتی: «کە پەروەردگار بەهەشتی خولقاند، پێی گوت "بدوە". گوتی[4]: "بەخت بەرزە ئەو کەسەی دەگاتە من". خودا فەرمووی: "سوێند بە گەورەییم! هەشت کەس ڕێت‌پێ نابەن: ئەوانەی بەردەوام شەراوبخۆن یا خۆ زیناکەن، دووزمان بن، دەوێتی[5] کەن، پاسەوان و مێرمەندۆک[6] و دابڕ لە خزمان و ئەوەی بڵێ: سوێند بە خودا کەوا دەکەم، کە چی وا نەکا"».

لە خەبەردا هاتووە کە «لە نێو بەنی ئیسرائیلدا قاتی دا هات. چەن جار نوێژە بارانەیان خوێند و هیچ کەڵکی نەبوو؛ تا ئەوەی وەحی هاتە سەر مووسا کە: پەرسڤی دوعاتان نادەمەوە، چونکوو دووزمانێکتان لە ناودایە. گوتی: "پەروەرندەم! ئەوە کێیە تا لە ناو خۆمان وەدەری خەین؟". فەرمووی: "من کە دووزمان بە دوژمنی خۆم دەزانم، ئێستە خۆم دوزمانی‌کەم؟" مووسا بە هۆزەکەی

---

١ ـ قورئان (١١/٦٨) هەرتانە لە خەلک دەداو قسە بۆ ئەم و ئەو دەبا. (هـ).

٢ ـ قورئان (١/١٠٤) هەوارە لە هەر کەسێکی بە تەشەری خوسپەکەرە. (هـ).

٣ ـ قورئان (٤/١١١) دەستە چیلە بە کۆڵ دێنا. (هـ).

٤ - بەهەشت گوتی.

٥- دەوێت: بێ‌ناموس.

٦- مەبەست ئەو مێرمەندۆکەیە کە لەگەڵ پیاوان دەخەوێ.

گوت هەموویان لە دوزمانی پاشگەز بن و داوای لێبوردن لە خودا کەن، پەروەردگاریش بارانی بە سەریاندا باراند».

دەڵێن کابرایەک بە دووی هۆزانێکدا دەگەڕا تا وەرامی ئەم پرسیارانەی پێ بداتەوە کە «ئەوە چییە لە ئاسمان بەرفراوانترە، لە زەوی گرانترە، لە بەرد سەختترە، لە ئاور داخترە، لە سەرمای زستان ساردترە، لە دەریا دەوڵەمەندترە و لە سێوی و هەتیو مل کزترە». هۆزان گوتی: «بوختان بەستن بۆ بێ تاوان لە زەوی گرانترە، راستەقینە لە ئاسمان بەرفراوانترە، دڵی قانع لە دەریا دەوڵەمەندترە، ئێرەیی لە ئاور بەسۆترە، لە کاتی تەنگانەدا نەهاتنە دەنگەوەی خزمان، لە سەرمای زستان ساردترە، دڵی کافر لە بەرد رەقترە، دووزمانێ کە کەس گوێ بە قسەی نەدا، لە سێوی[1] مل کزترە».

**سەرنج**

ئاگادار بە کە دوزوانی بە تەنیا گێڕانەوەی پەیڤی کەسێک بۆ کەسێکیتر نییە؛ بەڵکوو هەرکەس نهێنیی کەسێک ئاشکرا کاو ئەو کەسە زیز کا، دوزوانی کردووە، جا ئەو نهێنیە چ وتە بێ و چ کردە، ئاشکرا کردنەکەش چ بە گوتن بێ و چ بە نووسین یا خۆ هێما و ئاماژە هیچ تەوفیر ناکا؛ بە کورتی لادانی پەردە لەسەر نهێنیی هەرکەس، بە هەرجۆر، دوزوانییە؛ مەگین ئەوەی ئەو کەسە بە پەنامەکی خیانەتی لە ماڵی خەڵکی کردبێ؛ ئەوسا رەوایە ئەو نهێنیە خویان کا و بە کورتی هەرچی زیانی موسوڵمانانی تێدا بێ هەروایە.

هەرکەس پێیبڵێن فلانکەس وای پێ گوتی، یاخۆ پیلانی وات بۆ دادەڕێژێ، یا شتێکیتر، دەبێ ئەم شەش کارە بە جێ بێنێ:

**یەکەم،** نابێ باوەڕی پێ بکا؛ چونکە دوزمان، خراپکارە و پەروەردگار فەرمووی: گوێ لە خراپکار مەگرن.

**دووەم،** ئامۆژگاری کا کە دوزمانی نەکا؛ چونکە بەرەنگاری لە خراپە پێویستە.

**سێهەم،** لەبەر رەزای پەروەردگار وەکوو نەیار سەیری کا، چونکە دوژمنی لەگەڵ دوزوان فەرزە.

**چوارم،** لەو کەسە دڕدۆنگ نەبێ، چونکە دڕدۆنگی حەرامە.

**پێنجم،** نەتوژێتەوە بۆ ئاشکراکردنی ئەو پەیڤە، چونکە پەروەردگار وتوویە لە پشکنین دوور بگرن.

**شەشم،** ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆش نییە، بۆ ئەویش پێیخۆش نەبێ. ئەو باسە بۆ کەسیتر نەگێڕێتەوە.

ئەم شەش خاڵە پێوست و فەرزن.

---

[1] سێوی: هەتیوی.

یەکێک لە لای عومەری عەبدولعەزیز دوزوانی دەکرد، گوتی: «بە وردی لێی ورد دەبمەوە، گەر درۆت گوت دەکەویتە بەر ئەم ئایەتە إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ[1] گەریش راستت گوت دەکەوێتە بەر ئەم ئایەتە هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ[2]، بەلام گەر دەتەوێ لە پەیڤی خۆت پەشیوان و پاشگەز بە، تا بتبوورم». گوتی: «لە کردەی خۆم پاشگەزبوومەوە ئەی ئەمیرەلمۆئمنین، بمبوورە».

کابرایەک بە هۆزانێکی گوت: «فلان‌کەس وای پێ گوتی». گوتی: «هاتی بۆ سەردانم، کەچی سێ خراپەت لەگەڵ کردم: ناوی برادەرێکت لە دڵم زڕاند، دڵی ئاسوودەمت شێواند و خۆتت لە لام کردە خراپکار».

سلەیمان کوڕی عەبدولمەلیک بە یەکێکی گوت: «شتێکت پێم گوتووە؟» گوتی: «نەمگوتووە». گوتی: «دادوەرێکی باوەڕپێکراو پێی گوتم». زوهرا[3] لەوێ دانشتبوو، گوتی: «گەورەم! دوزمان قەد دادگەر نابێ». گوتی: «راستت گوت».

حەسەنی بەسری گوتی: «ئەوەی قسەی خەڵکیت لەلا بڵێتەوە، قسەی تۆش لە لای خەڵک دەڵێتەوە: لێی دوور بگرەو بە نەیاری خۆتی بزانە؛ چونکە کاری وی هەم خوسپەیە، هەم بێ‌بەڵێنی و خیانەتە، هەم ئێرەیی و بەخیلییە، هەم دوڕازی و دوڕووییە و هەمیش گزی و خاپاندنە. هەموو ئەمانەش خەیانەتن. هەروەها گوتوویانە دووزوان ئەو کەسەیە کە بە ئاوەژووی هەموو خەڵکی، رقی لە قسەی راستە».

پەیغەمبەر فەرمووی: «دوزمان حەلاڵزادە نییە». ئاگادار بە بەلای دوزمان و بشێونە گەلێک گەورەیە و رەنگە لەو سۆنگەوە خوێنی زۆریش برژێ. کابرایەک کۆیلەیەکی دەفرۆشت، گوتی: «هیچ عەیبی نییە بێجگە لە دوزمانی و درۆزنی». کڕیار گوتی: «خەمت نەبێ» و کڕی و بردیەوە بۆ ماڵ. چەن رۆژ تێپەڕی و رۆژێ بەندەکە بە خاتوونی ماڵی گوت: «ئاغام خۆشی ناوێی و دەیەوێ کارەکەرێ بکرێ. شەو کاتێ نووست، چەن تاڵەمووی ردێنی ببڕە و بۆم بێنە تا بە سیحر، تۆی لە لا خۆشەویست کەم». بە کابرای گوت: «ژنەکەت گراوی کەسێکی‌تر بووە و تەمای کوشتنتی هەیە. خۆ بدە لە خەو تا لێت ئاشکرا بێ». شەو کابرا خۆی کردە خەو، ژنەکەی هات و ردێنی گرت تا چەن تاڵەمووی لێ ببڕێ. کابرا دڵنیا بوو کە ژنەرەی تەمای کوشتنی هەیە، کاردی دەرکێشا و ژنەی کوشت. ماڵەباوانی ژن کە ئەمەیان بیست، رۆیشتن و کابرایان کوشت. خزمانی کابرا بۆ تۆڵە

---

١ ـ (قورئان، ٤٩/٦)... فَتَبَيَّنُوا: هەر گا لە فەرمان لادەرێک دەنگ و باسێکتان بۆ دێنێ، بە وردی لێی ورد بنەوە. (هـ).

٢ - (قورئان، ٦٨/١١) هەرتانە لە خەڵک دەداو قسە بۆ ئەم و ئەو دەبا. (هـ).

٣ ـ مەبەست ئەبووبەکر محەممەد کوڕی موسلیمە (٥٨ـ ١٢٤ کۆچی مانگی).

ئەستاندنەوە، دەگەڵ خزمانی ژن بە شەڕ هاتن و لە هەردوولا لاشەی زۆر لە خوێندا گەوزا.
ئەمەش هەموو لە بۆ خاتری دوزمانی و ئاژاوەگێڕی بوو کە رووی دا.

**ئافەتی چواردەهەم**، دوڕازی‌کردنەلە نێوانی دوو نەیاردا؛ بە چەشنێ کە لەگەڵ هەریەکەیان بە دڵی خۆی بدوێ. یاخۆ باسی ئەم لە لای ئەو بگێڕێتەوە و باسی ئەو لە لای ئەم و لە لای هەریەکیان وا خۆی بنوێنێ کە دۆستی گیانی بە گیانی ئەوە. ئەمە لە دوزمانی خراپترە، پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس لەم دونیایەدا دوڕوو بێ، لەو دونیادا تووشی ئاورێکی دوزمان دەبێ».
کەواتە، ئەوەی لەگەڵ دوژمنێ تێکەڵ دەبێ، دەبێ هەرچی دەبیسێ، یا بێ‌دەنگ بێ، یاخۆ ئەوەی راستە و دەبێ ببێژرێ، بیلێت تا نەبێتە دوڕاز و دوڕوو. باسی ئەم بۆ ئەویتر نەگێڕێتەوە و واخۆ نەنوێنێ کە دۆستی گیانی بە گیانیم.
لە ئیبنی عومەریان پرسی، کاتێ دەڕۆینە لای پادشایان، وا دەپەیڤین کە دێینەدەر، واناڵێین. گوتی: «لە سەردەمی پێغەمبەردا بە دوڕووییمان دەزانی. هەرکەس بەبێ‌نیاز بڕواتە لای سوڵتان و لەوێ شتێ بڵێ کە لە دەرەوە نەیڵێ، دوڕوویی کردووە؛ بەلام گەر پێویست بوو، ئیزنی دراوە».

**ئافەتی پانزدەهەم**، پێداهەڵگوتن و تاریف و دەم تەڕی کردن.
لەمەدا شەش خەسار هەیە: چواری هی پەسن‌بێژە و دوانی هی پێدا هەڵگوتراوە.
**خەساری پەسن‌بێژ: یەکەم** ئەوەیە کە زۆر دەڵێ و درۆ دەکا و دەبێتە درۆزن. لە خەبەردا هاتووە کە «هەرکەس لە هەڵگوتن بە خەڵکیدا زێدەڕۆیی کا، رۆژی پەسلان زاری ئەوەندە درێژ دەبێ کە بە شوێنیدا کێشی دێ و پێ بە سەریدا دەنێ و سەرنخوون دەبێ».
**دووەم** ئەوەیە کە دوڕوویی لە پەیڤیدا بێ و لە تاریفیدا پێی بڵێ کە خۆشتم دەوێ، کەچی خۆشی نەوێ.
**سێهەم** ئەوەیە کە شتێک بڵێ کە خۆی لێی ئارخەیان نەبێ، وەکوو ئەوەی بە کەسێک بڵێ: پارسا و پارێزکار و زۆرزان و شتی وا.
کابرایەک، پەسنی یەکێکی‌تری لە لای پێغەمبەر دەکرد. پەیغەمبەر فەرمووی: «هەوار بە ماڵت! سەری کابرات پەڕاند»، دیسان گوتی: «کاتی بە کەسێکدا هەڵدەڵێی، بڵێ: "پێم وایە کە وایە و لە لای پەروەرندەمدا کەسێک پاک و پاراو ناکەم"، ئەوسا حسێبی ئەو کەسە لەگەڵ پەروەردگارە و خۆی دەزانێ کە چلۆنە».
**چوارم**، رەنگە پەسن‌کراو ستەمکار بێ و بەم پەیڤانە شاگەشکە بێ؛ کەچی شادکردنی ستەمکار

نارەوایە. پێغەمبەر فەرمووی: «کە بە خراپکاردا هەڵدەڵێن، پەروەردگار تووڕە دەبێ».

**پێدا هەڵگوتراویش** دوو زیانی تووش دەبێ:

**یەکەم**، تووشی لووتبەرزی و فیز و دەمار دەبێ. ڕۆژێ عومەر دانشتبوو، قەمچییەکی لە ناو لەپدا بوو. کابرایەک بە ناوی جاروود لەوێ رابورد. یەکێک گوتی: «ئەمە سەرۆکی ڕەبیعەیە[1]». کە ڕۆیشت، عومەر قەمچییەکی لێدا. گوتی: «گەورەم! بۆچ وات کرد؟» گوتی: «نەتبیست ئەم کابرایە چی گوت؟» گوتی: «ژنەفتم؛ چ بووە؟» گوتی: «ترسام دڵت تووشی خۆبەزلزانی بێ و ویستم لووتی بشکێنم».

**دووەم** ئەویە کە ئەگەر بە زانایی و چاکەکاری ناوی بەرن، ڕەنگە لە داهاتوودا تووشی سستی بێ و بڵێ: «من کە پیاوێکی تەواوم، چ پێویستم بە تۆژینەوەی زۆرتر هەیە». لەم سۆنگەوە بوو کاتێ لە لای پێغەمبەردا بە کابرایەکیاندا هەڵدەگوت، فەرمووی «سەریت بڕی؛ گەر بیبیسێ، ئیدی کاری چاک ناکات».

پەیغەمبەر فەرمووی: «گەر کەسێک بە چەقۆیەکی تیژەوە بڕواتە سەروەخت کەسێکیترەوە، چاکتر لەوەیە کە لە لای خۆی پەسنی کات».

زیاد کوڕی ئەسلەم دەڵێ: «هەرکەس گوێی لە پەسنی خۆی هەبێ، شەیتان دەڕواتە لای و هەڵیدەفریوێنێ؛ گەریش بڕوادارێکی خۆناس بێ، خۆبەکەم دەگرێ».

بەڵام گەر کەسێک ئەم شەش خەسارەی تووش نەبێ، پێداهەڵگوتن جوانە. پەیغەمبەر پەسنی یارانی کردووە؛ فەرمووی: «ئەی عومەر! گەر من بۆ پێغەمبەری هەڵنەبژێردرایم، تۆیان هەڵدەبژارد». هەروەها فەرموی: «سەرلەبەری مرۆڤەکان، بڕوایان لە هەمبەر ئەبووبەکر ڕانێن، هێشتا پێک نایێ و زۆری ئەم و کەمی ئەوانە». چونکە دڵنیا بوو ئەمان تووشی ئافەتی پێداهەڵگوتن نابن.

بەڵام بەخۆداهەڵگوتن کرێتەو پەروەردگار بەرگری لێ کردووە: فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمْ[2]. بەڵام گەر کەسێک پێشەوای خەڵک بێ و باسی خۆی بکا تا خەڵکی هۆی گەورەییەکەی بزانن، ڕەوایە؛ هەروەکوو پەیغەمبەر فەرمووی: «انا سَیِّدُ وُلدِ آدَمَ وَ لا فَخر»؛ واتە: من گەورەی مرۆڤانم و هیچ بەوەش لووتبەرز نیم. بۆیە ئەمەی گوت، تا هەمووان بکەونە دووی. یووسف گوتی: ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ[3].

---

١ ـ ڕەبیعە: هۆزێکی عارەبن.

٢ ـ (قورئان، ٣٢/٥٣) پاکانە بۆ خۆتان مەکەن.

٣ ـ (قورئان، ٥٥/١٢) [گوتی] بمکە بە سەرکاری نەغدینە و بەروبووی وڵات؛ چاوەدێری لێ دەکەم و لێزانیشم. (هـ).

**سەرنج**

کاتێ بە کەسێکیاندا هەڵگوت، دەبێ خۆ لە لووتبەرزی و فیز و دەمار بپارێزێ و بیر لە دوارۆژ کاتەوە و ترسی دوارۆژی لە دڵدا بێ، چونکە بێجگە لە خوا کەس هیچی لێ نازانێ. ئەوەش لە دۆژەەنەڕەست، سەگ و بەراز لەو هێژاترن و کەس بە دڵنیایی نازانێ کاری دوارۆژی چۆن دەبێ.

دەبێ بزانی، ئەو پەسنکەرە، گەر نووکوبەدی نهێنیەکانی بزانێ، پێیدا هەڵنالێ: دەبێ شوکرانە-بژێری خودا کات کە نهێنییەکانی لە خەڵک شاردۆتەوە و هەم بە دڵ و هەمیش بە کردەوە پیشان بدا کە پیێ ناخۆشە تاریفی بدەن.

تاریفی گەورەیەکیان کرد، گوتی: «پەروەرندەم! ئەمانە نامناسن، تۆ خۆت باشترم دەناسی». پەسنی کەسێکیتریان گوت، گوتی: «پەروەرندەم! ئەم کابرایە بە شتێک کە تۆ رقت لێیە، خۆی لێم نزیک دەکاتەوە، تۆ شایەت بە، بە دوژمن زانینی ئەم، خۆم لە تۆ نزیک دەکەمەوە». بە عەلی کوڕی ئەبیتالبدا هەڵیان گوت، گوتی: «ئەزبەنی! ئەو تاریفەی لێمیان کرد، لێم مەگرە و لەو کەمایەسییانەی هەمەو خەڵکی نایزانن بمبوورە و لەوەی ئەمان دەیڵێن چاکترم کە». کابرایەک رقی لە عەلی بوو، بە دوورویی پەسنی دەکرد و پێیدا هەڵیدەگوت. عەلی گوتی: «کەمتر لەوەم لەسەر زارتە و پتر لەوەم لە نێو دڵتە».

## بنەمای چوارەم - باسی تووڕەیی و رک و قین و ئێرەیی و دەرمانی ئەوانە

### باسی تووڕەیی

بزانە تووڕەیی بەسەردا زاڵ بوون، دانستەیەکی خراپە. سەرچاوەی تووڕەیی ئاورە؛ ئاورێک کە دڵ بریندار دەکا، هەروەها پێوەندی تووڕەبوون لەگەڵ شەیتانە. هەروەک فەرمووی: خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ[1]. کاری ئاور جووڵان و دانەمرکانە و کاری قوڕ دامرکان و نەجووڵانە. ئەوەی تووڕەیی بە سەریدا داسەپابێ، لە شەیتان نزیکترە تا لە مرۆڤ. لەم سۆنگەوە بوو کاتێ ئیبنی عومەر لە پەیغەمبەری پرسی: «چ شتێ لە تووڕەیی پەروەرندەم دوورم دەکا؟» فەرمووی: «تووڕە نەبوون». هەروەها بە پەیغەمبەری گوت: «کارێکم پێ بڵێ کورت و کاریگەر». فەرمووی: «لا تَغضب»؛ تووڕە مەبە. هەر چەندەی لێ دەپرسی، هەر ئەم پەرسڤەی پێ دەدایەوە.

پێغەمبەر فەرمووی: «تووڕەیی وەکوو ئەزوا[2] چلۆن هەنگوین دەفەوتێنی، بڕوا بە خەساردەدا». عیسا بە پارێزکارێکی گوت: «تووڕە مەبە». گوتی: «ناتوانم، چونکە مرۆڤم». گوتی: «سامان کۆوەمەکە». گوتی: «ئەمەم پێ دەکرێ».

بزانە، چونکە خاڵیبوونەوە لە تووڕەیی بە کەس ناکرێ، چاودێری لێکردنی زۆر گرینگە. پەروەردگار فەرمووی: وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ[3] بۆ تاریفی ئەو کەسانەی گوت رکی خۆیان دەخۆنەوە. پەیغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس بەر بە تووڕەبوونی خۆی بگرێ، پەروەردگار، تووڕەیی خۆی لێ دەگێڕێتەوە و هەرگا بیانوویەک بۆ خوا بێنێتەوە، پەروەردگار لێی وەردەگرێ.

---

[1] ـ قورئان (٧٦/٣٨) من لە ئاگر، ئەوت لە قوڕ وەدیهێنا. (هـ).

[2] ـ دەرمانێکی تاڵە کە عارەب «صبر»ی پێ دەڵێن.

[3] ـ قورئان (١٣٤/٣) [ئەو کەسانەی لە تەنگانەو فەرحانیدا...] رکی خۆیان دەخۆنەوە و لە مەردم چاوپۆشی دەکەن؛ [خـوا چاکـەکاری خۆش دەوێن]. (هـ).

هەرکەسیش ئاگاداری زمانی بێ، پەروەرندەی شەرم و شوورەییەکانی دادەپۆشێ». دیسان گوتی: «ئەوەی رکێک کە بتوانێ بینوێنێ، بیخواتەوە، پەروەردگار رۆژی پەسلان دڵی تەژی لە رەزا دەکا». هەروەها فەرمووی: «جەحەننەم دەرگایەکی هەیە کە هیچ کەس بێجگە لەوانەی بە ناڕەوا تووڕە بووبێتن، لەوێ نارۆنە ژوورەوە». هەروەها فەرمووی: «هیچ قومێ کە مرۆ دەیخواتەوە، لە لای پەروەرندەی هێژاتر لە قومی رک نییە کە دەیخواتەوە. هیچ مرۆیەک ئەوەی پێ ناخورێتەوە مەگین ئەوەی پەروەرندەی دڵی تەژی لە باوەڕ کا».

فوزەیلی عەییاز و سەفیانی سەوری و چەن گەورەیەکی‌تر رایان ئەوە بوو کە هیچ کارێک هێژاتر لە پشوودرێژی لە کاتی تووڕەیی و بەکاوەخۆیی لە کاتی چاوچنۆکی نییە.

یەکێک لەگەڵ عومەری عەبدولعەزیز بە توندی ئاخاوت. سەری داخست و گوتی: «ویستت تووڕەم کەی تا شەیتان بە هۆی گەورەیی و پلە و پاگەوە دنەم بدا و ئازارت بدەم، تا سبەینێ لە لای پەروەرندەم تۆڵەم لێ بستێنی؟ قەد وانابێ» و بێ‌دەنگ بوو.

یەکێک لە پێغەمبەرەکان گوتی: «کێهە لە من پەند وەربگرێ کە قەد تووڕە نەبێ و پاش مردنم ببێتە جێگرم و لە بەهەشتدا هاوشانم بێ؟» یەکێک گوتی: «من بەڵێنم دا و پەزێرام». جارێکی دی گوتی و هەر ئەو گوتی: «من پەزێرام». لەسەر بەڵێنییێ کە دابووی لای نەدا و بوو بە جێگری ئەو پێغەمبەرە. پاشان ناوی «ذولکفل»یان بەسەردانا، چونکە بوو بە ئاریکار و جێگری ئەو پێغەمبەرە.

**سەرنج:** بزانە رکیان بۆیە لە مرۆڤدا ئافراندووە تا وەکوو چەک لە هەرچی زیانی پێ دەگەینێ، بیپارێزێ؛ وەکوو شاوەت کە بۆیە ئافرێندراوە تا هەرچی سوود و خێری بۆی هەیە بەرەولای خۆی رایکێشێ. مرۆڤ لەم دوانە دەربازبوونی بۆ نییە. بەڵام گەر زێدەڕۆیی تێدا بکا، وەکی ئاورێکە کە دووکەڵی کونج و قوژبنی مێشک و فام دادەگرێ و رێگای لێ بزردەکا و راست‌وناڕاستی لێ تێک دەدا؛ وەکوو ئاورێک لە ئەشکەفتێکدا دابگرسێ و هەموو ئەشکەوت لە دووکەڵ بئاخنێ و نووکوبەدی نوقمی دووکەڵ کا؛ ئەمەش گەلێک دزێوە. بۆیە گوتوویانە تووڕەیی غوولی[1] ئاوەزە. جاری وا هەیە تووڕەیی زۆر کەم و لاوازە؛ ئەمەش دزێوە، چونکە پارێزگاری لە نامووس و بەرەنگاری لە دین و شەڕ دەگەڵ کافران، لە رکەوە هەڵدەستێ. پەروەردگار بە پەیغەمبەری گوت: جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ[2]. پەسنی یارانی پێغەمبەری کرد و گوتی: أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ. ئەمانەش هەمووی

---

١ ـ غوول: نەفس و داخوازەکانی کە مرۆڤ دەخاپێنن و دەیفەوتێنن.

٢ ـ (قورئان، ٧٣/٩) دەگەڵ کافران و دوڕووان شەرکە و بە توندی دەگەڵیان رەفتار کە.

ئەنجامی رک و تووڕەیین.

کەواتە، هێز و ورەی تووڕەیی نابێ نەکەم بێ و نە زۆر، بەڵکوو دەبێ ناونجی بێ و لە ژێر رکێفی ئاوەز و ویندا بێ.

برێ کەس لایان وابوو مەبەست لە کۆشەوە، بە تەواوی سڕین و نەهێشتنی تووڕەییە و ئەمەش هەڵەیە؛ چونکی تووڕەیی چەکە و نابێ بفەوتێ. تا مرۆڤ زیندوو بێ، تووڕەیش هەیە، وەکوو شاوەت کە فەوتانی بۆ نییە. بەڵام دەبێ لە هەندێ شوێن و برێ کاردا بەرپیوار و نادیار بێ، بە چەشنێ کە وا بە دڵدا بێ کە لەسەر چاوەوە نەماوە.

مرۆڤ کە شتێکی لێ بستێنن تووڕە دەبێ. بەڵام ئەو شتەی کە پێویست نییە، وەکوو سەگێک کە نیازێ پێی نەبێ و کەسێک لێی بدا، یان بیکوژێ رەوایە، تووڕەبوونی بۆ نییە. بەڵام شتی وەکوو خواردن و خانووبەرەو جلوبەرگ و تەندروستی، مرۆڤ لێیان بێ نیاز نابێ. کەوابوو، گەر کەسێک برینداری کاو تەندروستی بخاتە مەترسییەوە، یاخۆ خواردنی بفەوتێنێ یان خانووبەرەی داگیرکا، بێگومان تووڕە دەبێ. بۆیە ئەوەی نیازی زۆرترە، تووڕە بوونیشی زۆرترە و لە ئەنجامدا بێئەنواتر و دۆشداماوترە. لەڕاستیدا سەربەستی لە بێنیازیدایە: هەرچەن نیازی مرۆ زۆرتر بێ، لە کۆیلەیی نزیکترە. کەسی وا هەیە بە کۆشەوە زۆربەی نیازەکانی لادەبا و بێجگە لەوەی بۆ ژیان پێویستن، هیچیدی ناهێڵێتەوە و ئەو تووڕەییانەش پاشەرۆکی ئەو نیازانەن، تەفروتوونا دەبن؛ ئەوەی پاپای پلە و پاگەی دونیایی لە دڵدا نەبێ، بۆی هیچ تەوفیر ناکا، کەسێک لە ژوور یان لە خواریەوە دابنیشێ و تووڕە نابێ. جیاوازی نێوان خەڵک لەم چەمکەدا زۆرە و زۆربەی تووڕەییەکان لە سۆنگەی کەم و زۆر بوونی پلە و پایە و ماڵوسامانەوە دێنەدی؛ تەنانەت هەیە شانازی بەشتی زۆر بێنرخەوە دەکا، وەکوو شانازی بە خواردنەوە و شەترەنجکردن و کۆترباری و...؛ ئەگەر یەکێک پێی بڵێ چاک یاری ناکەی، یان زۆر ناخۆیتەوە تووڕە دەبێ و بە کابرادا هەڵدەخوشێ. بێ گومان ئەم شتانە بە چاودێری و کۆشەوە لەکۆڵ دەبنەوە، بەڵام ئەوانەی مەرج و نیازی ژینن، لە کۆڵ بوونەوەیان نە دەلوێ و نە رەوایە. بەڵام نابێ هەوساری لە دەس بسێنێ و لە فەرمانی ئاوەز و شەرع کلابێ. بە کۆشەوە، رک و تووڕەیی دێنە ئەم ئاستە. بەڵگە بۆ ئەوەی تووڕەیی لە مرۆڤ جیانابێتەوە ئەوەیە کە پەیغەمبەر فەرمووی: «من مرۆڤم، تووڕە دەبم، وەکوو چۆن مرەڤ تووڕە دەبێ. پەروەرندەم! هەر مرۆڤێ کە دەکەوێتە بەر تووڕەیی و لێدان و داخورین و لەحنەتم، تۆ بە رەحمەت و بەزەیی بۆی بنووسە».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمروعاس گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! هەرچی دەڵێی بینووسم؟» فەرمووی: «بینووسە، هەر چەند تووڕە بم؛ چونکە بە خودایەک منی بۆ رێنومایی خەڵکی ناردووە!

---

١ ـ (قورئان، ٢٩/٤٨) توندو تیژن لەگەڵ کافران.

هەرچەند تووڕەش بم، بێجگە لە ڕاستیم بە زاردانایە». نەیگوت «تووڕە نابم» بەڵام گوتی «تووڕەیی لە ڕاستەڕی کلام ناکا».

ڕۆژێک عایشە تووڕە بوو. پەیغەمبەر فەرمووی: «شەیتانت هات». گوتی: «تۆ شەیتانت نییە؟» فەرمووی: «هەمە، بەڵام پەروەرندەم منی بە سەردا زاڵ کردووە و هاتۆتە ژێر ڕکێفم؛ بێجگە لە چاکە چیدی ناڵێم». نەیفەرموو «من شەیتانی تووڕەییم نییە».

**سەرنج**: هەر چەند ڕک و تووڕەیی بە یەکجاری لە دڵ پاک ناکرێتەوە، بەڵام دەبێ بیری تاکپەرستی وا بە سەردڵدا داسەپێ کە هەرچی دەبینی لە سۆنگەی پەروەردگارەوە بیزانی. بۆیە تووڕەیی بە تاکپەرستی دادەپۆشرێ و هیچی لێ خویان نابێ؛ هەر وەکوو ئەوەی ئەگەر بەردێک بۆ کەسێک بهاوێژرێ و لیێ بدا، ئەو کەسە لەبەردەکە تووڕە نابێ، تووڕەیش هەر لە جێی خۆیە و هەروەک خۆیە؛ چونکە ئەم سووچ وتاوانە لە چاو بەردەکەوە نابینێ، بەڵکوو لەو کەسەی دەزانێ کە بەردەکەی هاویشتووە. هەروەها گەر پادشایەک نامەی لە سێدارەدانی کەسێک ئیمزا کات، ئەو کەسە لە قەڵەمەکە تووڕە نابێ، چونکە دەزانێ قەڵەم لە ژێر ڕکێفی پادشایە و بە ویستی خۆی نابزوێتەوە، هەرچەن ئەو ئیمزاکەی کردووە.

**سەرنج**- ئەوەی تاکپەرستی بە سەر دڵیدا زاڵ بێ و دڵی پڕ لە تەوحید بێ، دەزانێ سەرلەبەری خەڵکی لە بەرانبەر ئەوشتەی خودا بە سەریاندا دەیهێنێ، ناچارن. چونکە هەرچەند بزووتنەوە لە ژێر دەسەڵاتی هێز و وزەدایە، بەڵام هێزیش لە بەندی ئیرادە و خوازەیە[1]؛ ئیرادەش بەویستی خودی مرۆڤ نییە، بەڵام خوازەیان بە سەریدا زاڵ کردووە، بیەوی یا نە. کە خوازەیان پێدا و هێزیشی بوو، بێ گومان کردە جێبەجێ دەبێ.کەواتە، ئەمە هەمان بەرد هاویشتنە و بە هۆی بەردەکەوە ئێشی پێ دەگا، بەڵام لێی زویرو تووڕە نابێ، هەروەها گەر خۆراکی کەسێک بە هۆی مەڕێکەوە دابین بێ و ئەو مەڕە مردار بێتەوە، خەمبار دەبێ، بەڵام تووڕە نابێ. بەم بۆنەوە، گەرکەسێک ئەو مەڕە بکوژێ، دیسان دەبی هەروا بێ. ئەو کەسەی تاکپەرستی بە سەر دڵیدا زاڵە، زاڵبوونی تاکپەرستی بەم ڕادەیە، بەردەوام نییە و کاتییە و زوو تێدەپەڕێ، وەکوو برووسکەیەک دێت و دەڕواو سروشتی مرۆڤ بە هۆی ئەو هۆکارانەی کە دێنە ئاراوە، ئاشکرا دەبێ. زور کەس لە هەندێ بارودۆخدا وایان کردووە. هۆی ئەمەش ئەوە نییە کە تووڕەیی بنەبڕ کردووە، بەڵکوو چونکە ئەو کارەساتە لە سۆنگەی کەسەوە نابینێ،

---

[1] - خوازە: ئیدیعا

تووڕییەکەی ئاشکرا نابێ، وەکوو بەردێک کە بۆی خرابێ. تەنانەت ڕەنگە تەوحید زۆریش بە سەر دڵیدا زاڵ نەبێ، بەڵام چونکە دڵی پەرژاوەتە سەر کارێکی گرینگتر و ئاگای لە خۆی بڕیوە، تووڕەییە-کەی ئاشکرا نەبێ و نەزانێ بە خۆی.

یەکێک جنێوی بە سەلمان دا. سەلمان گوتی: «گەر تای گوناحەکانم لە پەسلاندا قورس بێ، لە-وەی کە تۆ دەیڵێی خراپترم، گەریش سووک بوو، چ خەمم هەیە لە قسەی تۆ؟» یەکێک جنێوی بە ڕەبیعی خەیسەم دا. گوتی: «لە نێوان من و بەهەشتدا ملەیەکی هەڵەت هەیە، کە خەریکم دەیبڕم. گەر بیبڕم قسەی تۆ هیچ ناکا، گەریش نەیبڕم، لەوەی تۆ دەڵێی خوارترم». هەر دووی ئەمانە وا لە بیری پەسلاندا نوقم بوون، تووڕەییان دیاری نەدەدا. یەکێک بە مالکی دیناری گوت مەراییکەر. گوتی: «کەس وەکوو تۆ نەیناسیم». یەکێک ڕەخنەیەکی لە شەعبی گرت، گوتی: «گەر ڕاست دە-کەی، خوا بمبووری؛ گەریش درۆ دەکەی خوا بتبووری».

ئەم سەربهوردانە پێمان پیشان دەدەن کە ڕەوایە تووڕەیی بەم بارودۆخانە بشاردرێتەوە. هەروەها ڕەوایە کەسێک نەیزانیبێ کە پەروەردگار پێی خۆشە کە تووڕە نەبێ و کاتێ هۆیەک بۆ تووڕەبوون هاتەگۆڕێ، خۆشەویستی پەروەردگار ئەو تووڕەییەی دادەپۆشێ. هەروەکوو کەسێک گراوێکی بێ و ئەو گراوەی منداڵی ئەم ئازار بدا، ئەویندارەکە پێی ناخۆشە منداڵەکەی ئازار ببینێ، بەڵام دەسەڵاتی خۆشەویستەکەی بە سەردڵیدا وای لێ دەکا کە ئەو ئەم ستەم و جەفایەی بە دڵدا نەهێنێ و تووڕە نەبێ. کەواتە، دەبێ مرۆڤ بە یەکێک لەم هۆکارانە خۆی تەیار کا و تووڕەیی بکوژێ؛ گەر پێی نەکرا، ئەوەندە هێزی بشکێنێ تا سەربزێو نەبێ و بەئاوەژووی ئاوەزو شەرع نەبزوێ.

**سەرنج-** بزانە دەرمانی تووڕەیی و کۆشەوە بۆ ڕاگرتنی، فەرزو پێویستە، چونکە تووڕەیی زۆربەی خەڵکی بەرەو دۆژەهـ دەبا و گەندەڵی زۆری لێ دەبیتەوە. دەرمانی تووڕەیی دوو جۆرە: یەکیان وەکوو ڕەوانکەرە، بنج و بناوانی تێک دەدا و دەیبا؛ یەکیشیان وەکوو سکەنجەمینە کە بنج وبناوانی تێک نادا، بەڵام هێوری دەکاتەوە.

ڕەوانکەر ئەوەیە کە سەرەتا ورد بێتەوە و بزانێ هۆی تووڕەیی لە دەروونداچییە، بنجی ئەو هۆوانە تێک بدا؛ ئەوەش پێنج هۆوە:

### هۆکانی تووڕەیی

**یەکەم-** خۆبەزلزانییە؛ مرۆڤی لووتبەرز بە بچوکترین پەیڤ یان کردەوە کە بە ئاوەژووی ڕێزگرتنی ئەو بێ، تووڕە دەبێ. دەبێ بەخۆبەکەمزانی، لووتی بەرزی بشکێنێ و بزانێ ئەمیش لە ماکی بەندە-

کانیتره و هێژایی هەرکەس بە هۆی بەرزی ئاکارییە و لووتبەرزی لە ریزی ئاکاری نزم وچرووکدایە. لووتبەرزی تەنیا بە خاکەساری دەرمان دەکرێ و بەس.

**دووم**- خۆپەسەندی، کە باوەڕی زۆری بە خۆیە و دەرمانی ئەمەش ئەوەیە کە خۆی بناسێ. نووکوبەدی دەرمانی خۆبەزلزانی و خۆپەسەندی لە جێی خۆیدا راڤە دەکرێ.

**سێیەم**- گاڵتە و گەپچاڕە کە زۆرجار ئەنجامی دەبێتە تووڕەیی. دەبێ لە سەر ناسینی خۆی وکاری دوارۆژ و بە دەستهێنانی ئاکاری جوان، جەخت کا و واز لە گاڵتە وگەپچاڕ بهێنێ. هەروەها پێکە-نینی زۆر و قەشمەری، ئاکامی دەبێتە تووڕەیی. دەبێ خۆی لێ بپارێزێ، چونکە هەرکەس قەشمە-ری کا، قەشمەری پێ دەکرێ؛ کەواتە، گەرکەسێک قەشمەری پێ کرد، خۆی بۆتە هۆی سووکایەتی بە خۆی.

**چوارم**- لۆمە وسەرکۆنە و تەوس و توانج لە خەڵک گرتنە، ئەوەش دەبێتە هۆی تووڕەیی هەر دوو لایەن. چارەی ئەمەش ئەوەیە کە بزانێ هەرکەس تا خۆی بەتەواوی لە کەمایەسی بەدوور نەبێ، ناتوانێ رەخنە وتەوس لە خەڵکی بگرێ، دیارە، کەسیش بێ کەمایەسی نییە.

**پێنجەم**- چاوچنۆکی و چاوەنزێرییە بۆ زۆروزەوەندەبوونیماڵوسامان، چونکە بە هۆی چاوچنۆکی و چاوەنزێرییەوە نیازەکان زۆر دەبن. ئەوەی بەخیل و رژد بێ، بە هۆی دەنکە گەنمێکەوە کە لێیبستێنن زویر دەبێ. هەر کەسەش چاوەنزێر بێ بە هۆی پارووییەک کە لێی کەم بێتەوە، تووڕە دەبێ.

ئەمانە هەموویان ئاکاری خراپن وهۆی تووڕەیی هەر ئەمانەن.

سەرنج- **دەرمانی زانستی و کردەیی تووڕەیی**: دەرمانی ئەم دەردانە هەم بە زانستە و هەم بە کردەوە. بەڵام زانستیەکەی ئەوەیە کە ئافەت و زیانی تووڕەیی لە دونیا و پەسڵاندا بزانێ، تا بە دڵ لێی بێزار بێ، پاشان بپەرژێتە سەر دەرمانی کردەیی. ئەم دەرمانەش ئاوەهایە کە بۆ دژایەتی لەگەڵ ئەم خووە نزمانە را دەبێ، چونکە دەرمانی هەر ئاکارێک، دژایەتیکردنیە، هەر وەک لە پارێزکاری لە نەفسدا باسمان لێی کرد.

یەکێک لە هۆوە گرینگەکانی هەڵخڕاندنی تووڕەیی، دۆستایەتییە لە گەڵ کەسانێک کە تووڕەیی بە سەریاندا زاڵە و رەنگە ئەو تووڕەییە بە ئازایی و بوێری ومێرخاسی بزانن و شانازی پێوە بکەن و بگێڕنەوە کە «فلان گەورە پیاو لە سەر یەک قسە فلان کەسی کوشت و ماڵ و حالی تێک دا و کەس نەیوێرا بڵێ لەل؛ چونکە پیاوێکی پیاوانە بوو. پیاو دەبێ ئاوەهابێ». لێبوردن و هیچ نەگوتن بە ناپیاوی و ناچیزەیی دەزانن. کەواتە، تووڕەیی کە پیشەی سەگانە- بە پیاوەتی و پشوودرێژی -کە

ئاکاری پێغەمبەرانە- بە ناپیاوی و خوێڕیەتی دەزانن. کاری‌تریان هەر ئەوەیە کە بە فێڵ و گزی وخایاندن و بە وشەی ناحەز بەر بە ئاکاری جوان بگرێ و بە قسەی جوان بەرەو ئاکاری خراپی گاس بکا. مرۆڤی ژیر و زانا باش دەزانێ کە گەر هۆی تووڕەیی پیاوەتی بوایە، دەبوایە ژنان و منداڵان و پیر و پەککەوتووان تووڕە نەبوایەن. کەچی ئەم کەسانە زۆرتر تووڕە دەبن. لە ڕاستیدا هیچ پیاوەتییەک سەرتر لەوە نییە کە کەسێک بەرەنگاری تووڕەیی خۆی بێتەوە. ئەمە تایبەتمندی پێغەمبەران و یارانی خودایە؛ کەچی ئەویتر تایبەتمەندی ئەوانەیە کە بە خوو و خدە لە گیاندارانی دڕندە نزیکترن. جا خۆت ڕامێنە و بزانە کە گەورەیی لەوەدایە کە وەکوو پێغەمبەران بی یان وەکوو نەزان و کەم ئاوەزان.

**سەرنج** — ئەمەی کە بێژرا، ڕەوانکەر بوو، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێ بە تەواوی بنج و بناوانی تووڕە-یی تێک بدا. بەڵام ئەوەی کە بۆی تێک نادرێ، دەبێ لە کاتی تووڕەییدا خۆی هێور کاتەوە. هێورکردنەوەی بە ماجوونێکە کە لە شیرینی زانست و تاڵی پشوودرێژی دێتە دەست. دەرمانی هە-موو دەردی ئاکاری ئەم ماجوونەیە. بەڵام زانست ئەوەیە کە لەو ئایات و ئەخبارەی کە لۆمە و سە-رکۆنەی تووڕەیی دەکەن و پەسن وتاریفی قووت‌دانی تووڕەیی دەکەن، ورد بێتەوە -هەر وەک بێژرا- و بە خۆی بڵێ: «پەروەردگار بە سەر تۆدا بە دەسەڵاتترە تا تۆ بە سەر ئەو کەسەدا، تۆ زۆرتر دژایەتی لە گەڵ خودا دەکەی تا ئەو کەسە لە گەڵ تۆ، دەسا چۆن لە خۆت دڵنیای کە ئەمرو لەو کەسە تووڕە بی و پاشەرۆژ خودا لێت تووڕە نەبێ؟»

هەروەک پێغەمبەر کارەکەرێکی نارد بە شوێن کارێکدا، دێر هاتەوە، گوتی:«ئەگەر تۆڵەی ڕۆژی پەسڵان نەبایە، لێتم دەدا». هەروەها بە خۆی بڵێ: « هۆی تووڕەییت ئەوەیە کە کارەکەت بەو چە-شنە جێ‌بەجێ بووە کە خودا ویستوویە، نە بەو چەشنەی کە خۆت دەتەوێ؛ دەتەوێ ململانێ لە گە-ڵ خوا بکەی؟» گەر بەم هۆکارانەوە کە هی دوارۆژن تووڕەییەکەی دانەمرکا، هۆکاری دونیایی بێنێتە ئاراوە و بڵێ: «گەر لێی تووڕەبی، ڕەنگە ئەویش بەرەنگارت بێ و وەڵامت بداتەوە. نابێ دوژمن بە بچووک بگری: بۆ وێنە گەر کۆیلەیەک بێ و لە پەرایی کردنتدا کورتی بکا، ڕەنگە فێڵ و گزییەکیشت لە گەڵ بکا گەر لێت تووڕە بێ». هەروەها ڕوومەتی خۆی بێنێتە بەرچاو کە چەن دزێو و کرێت دەبێ لە کاتی تووڕەییدا، وەکوو گورگێک کە لە گیانی کەسێکدا بەردەبێ و هەموو هەناوی دەبێتە ئاور و وە-کوو سەگێکی برسی لێ دێ. زۆرجار بۆی هەیە کە بە نیازە ببوورێ، کەچی شەیتان پێی دەڵێ: «خەڵکی ئەم لێبوردنەت بە لاوازی و بێ‌دەسەڵاتی و داماوی دەزانن و شان و شکۆت دەشکێ و لە لایان سووک وبێ بایەخ دەبی». لە وەڵامیدا دەبێ بڵێ: «هیچ هێژاییەک ناگاتە ئەوەی کە مرۆڤ پا

بنێتە جێگە پای پێغەمبەران و خودای لێ خۆش بێ. گەر ئەمڕۆ خەڵکی دونیا بە سووکم بزانن چاترە لەوەی لە پەسلاندا و لەلای خودا سووک و بێفەڕ بم». ئەمانە وەکوو ئەمانەی بێژران دەرمانی زانستین.

بەلام دەرمان بە کەردەوە ئەوەیە کە بە زار بڵێ: «أَعوذُ باللهِ مِن الشَّيطانِ الرَّجيم». سوننەت ئەوەیە کە گەر راوەستا بێ، دابنیشێ، گەر دانشتبێ، لە سەر شانی راکشێ؛ گەر بەمانە هێور نەبووەوە بە ئاوی سارد دەسنوێژ بشوا، چونکە پێغەمبەر فەرمووی:«تووڕەیی لە ئاورە، بە ئاو دادەمرکێ». لە رەوایەتێکدا هاتووە کە کڕنوش ببا جەمینی بنێتە سەر خاک، تا ئاگادار بێتەوە کە لە خاک ئافرێندراوە و بەندەیە و بۆ نالوێ کە تووڕەبێ. جارێک عومەر تووڕە بوو، داوای ئاوی کرد و بە کەپۆیدا کرد و گوتی: «تووڕەیی هی شەیتانە و بەمە نامێنێ». رۆژێک ئەبووزەر لە گەڵ کابرایەک بە شەڕهات، پێی گوت: «یابن الحمراء»؛ واتە پلاری لە دایکی کرد کە سوورە، واتە کۆیلەیە. پێغەمبەر فەرمووی: «بیستم ئەمڕۆ تیز و پلارت لە دایکی کەسێک گرتووە، بزانە تۆ لە هیچ رەش وسوورێک هێژاترو سەرتر نی، مەگەر بە پارێزگاری سەرتر بی». ئەبووزەر رۆیشت تا داوای لێبوردن لەو کەسە کات. کابرا لە دوورەوە هات و سلاوی لە ئەبووزەر کرد.

کاتێ عایشە تووڕە دەبوو، پێغەمبەر لووتی دەگرت ودەیگوت:ئایشیلێ[1]: بلێ«اَللّهُمَ رَبَ النَّبیَّ مُحمَد اغفِرلی ذَنْبی وَاَذْهَبْ وَغَيْظ قَلبی آجِرنی مِنْ مُضلاَت الفتَن[2]». گوتنی ئەمەش سوننەتە.

**سەرنج-** بزانە، گەر کەسێک ستەمی لێ کرد، یان جنێوێکی خراپی پێ دا، چاتر وایە کە بێدەنگ بێ و هیچ نەڵێ؛ بەلام فەرز نییە کە بێدەنگ بێ ، هەرچەن ناتوانێ وەلامێکی پێ بداتەوە، چونکە تۆڵەی جنێو بە جنێو و خوسپە بە خوسپە رەوا نییە؛ بە هۆی ئەمانەوە حەدی شەرعی پێویست دە- بێ. بەلام دەتوانێ قسەیەکی توندی پێ بلێ کە درۆی تێدا نەبێ، ئەمە وەکوو تۆڵە ئەستاندنە. هە- رچەند پێغەمبەر گوتوویە: «گەر کەسێک بەو کەمایەسییەی کە هەتە، خراپەی پێ وتی، تۆش بەو خراپییەی کە لەوداهەیە خراپەی پێ مەڵێ». ئەمە موستەحەبە و فەرز نییە کە وەلامی نەدەیتەوە. ئە- گەر جنێوەکەی بە زینا تاوانبار کردن نەبێ. هۆکەشی ئەوەیە کە پێغەمبەر فەرمووی: «اَلْمُستَبانِ ما قالا فَهُوَ عَلَى الْبادی حَتّی یَعْتَدی الْمَظلومُ»؛ واتە: دوو کەس کە جنێو بە یەک دەدەن، هەرچی دەڵێن

---

١ - لە بەرانبەر«عایشگک»ەوە دامناوە. کە بۆ دواندن ونازکێشان هاتووە.

٢ - خوایا ! ئەی راهێنەری محەمەدی پێغەمبەر! لە گوناحم خۆش بە و دلم لە تووڕەیی پاکژکەوە و لە شەڕ وکێشەی لارێ بوون بمپارێزە.

گوناحەکەی بۆ ئەو کەسەیە کە سەرەتا دەستی پێکردووە، تا ئەو کاتەی کە ستەملێکراو لە ئاستی خۆی لابدا. عایشە دەگێڕێتەوە کە: «ژنەکانی پێغەمبەر بە فاتمەدا هەواڵیان ناردە سەر پێغەمبەر کە پێ بڵێ "لە نێوان ئێمە و عایشەدا هاوسەنگی ڕاگرە، چونکە زۆرتر ئەوی خۆش دەوێ تا ئێمە". پێغە-مبەر ڕاکشابوو، فەرمووی: "ئەی فاتمە! ئەوەی من خۆشم دەوی تۆ ناتەوێ؟" گوتی:"دەمەوێ". فە-رمووی:"کەواتە عایشەت خۆش بۆی چونکە من خۆشیم دەوێ". گەڕایەوە و باسەکەی بۆ گێڕانەوە. گوتیان: "ئێمە بەمە ڕەزا نابین". ئەم جارە زەینەبیان نارد -کە ئەویش ژنی پێغەمبەر بوو و لە خۆشەویستیدا شانی دەدا لە شانی من. گوتی: "کچی ئەبووبەکر فلان وفیسار" و زۆری خراپە پێگوتم. من هەروا بێدەنگ بووم تا بەڵکوو پێغەمبەر ئیزنی وەڵام دانەوەم بدا. کە ئیزنی پێ دام ، زوانم لێهەڵمالی و ئەوەندە خراپەم پێیگوت کە زمانم وشک بوو و ئەویش بێدەنگ بوو. پێغەمبەر فە-رمووی:" ئەمە کچی ئەبووبەکرە": واتە ؛ ئێوە ناتوانن چەنە لە چەنەی بدەن». کەواتە، ئەمانە بەڵگەن بۆ ئەوەی کە وەڵامدانەوە ڕەوایە، گەر ڕەوابێ و درۆ و هەڵبەستە نەبێ؛ وەکوو ئەوەی کە بلێ«ئەی نە-فام! ئەی نەزان! شەرم کەو بێدەنگ بە!» چونکە هیچ مرۆڤێک لە نەزانی ونەفامی بەدوور نییە و دەبێ زمان بە گوتەیەک خوو بکا کە کرێت نەبێ تا لە کاتی تووڕەییدا ئەوەی کە دەیلێ جنێو نەبێ؛ هەر وەک گوتنی: «ئەی ناکەس و نەگونجاو و بێنەوا» و شتی لەم جۆرە. بە گشتی کە وەڵامی دایەوە، زۆر ئەستەمە بتوانێ لە سەر حەدی خۆی کلا نەبێ، بەم بۆنەوە وەڵام نەدانەوە چاکترە.

یەکێک لە لای پێغەمبەر جنێوی بە ئەبووبەکر دەدا و ئەویش بێدەنگ بوو. کاتێ ئەبووبەکر ویستی پەرسڤی بگێڕێتەوە، پێغەمبەر هەستا کە بڕوا، ئەبووبەکر گوتی: «تا ئێستا دانشتبووی، کە ویستم وەڵامی بدەمەوە هەستای؟» فەرمووی: «تا بێدەنگ بووی، فریشتەکان بۆ تۆ وەڵامیان دەدایەوە، کە وە-ڵامت دایەوە، شەیتان هات، نامەوی لەگەڵ شەیتان لە یەک شوێندا بم».

پێغەمبەر فەرمووی:« مرۆڤەکان چین چین ئافرێندراون: یەکێک هەیە کە دێر تووڕە دەبێ و دێریش خۆش دەبێ. یەکێکیتر هەیە زوو تووڕە دەبێ وزوو خۆش دەبێ. ئەم دەکەویتە بەرانبەری ئەو. چاکترینی ئێوە کەسێکە کە دێر تووڕە بێ و زوو خۆش بێ و خراپترتان ئەوەیە کە زوو تووڕە بێ و دێر خۆش بێ».

## ڕق وقین

**سەرنج**– بزانە هەر کەس بە ویستی خۆی و بە پێی ئایین، تووڕەییەکی بخواتەوە، زۆر پیرۆزە؛ بە-لام گەر لە بەر ترسان یا ناتوانی بێدەنگ بێ، لە دەروونداا کۆی دەکاتەوە و تەشەنە دەکا و دەبێتە ڕق وقین. پێغەمبەر فەرمووی: «المؤمن لیس بحقود»؛ باوەڕدار، ڕکوونی نابێ. کەواتە، ڕک کردن، بەرهەمی تووڕەییە و لەمەش هەشت وەچەیتر دەکەونەوە کە هەر یەکەیان بە تەنیا خۆی هۆی فەوتانی دینە:

**یەکەم** - ئێرەییبەر بە شادی ئەو کەسە خەمبار دەبێ و بە خەمی شاد.
**دووەم**- شادوکامی، بە بەڵایەک کە پێی دەگا شاگەشگە دەبێ و ئەو شادوکامییەش پیشان دەدا.
**سێیەم**- لە گەڵی قسە ناکا و وەڵامی سلاویشی ناداتەوە.
**چوارەم**- بە سووکی سەیری دەکا.
**پێنجەم**- خراپەی دەڵێ و خوسپەی دەکا و جنێوی پێ دەدا و نهێنیەکانی ئاشکرا دەکا.
**شەشەم**- لاسایی دەکاتەوە و قەشمەری پێ دەکا.
**حەوتەم**- گەر بۆی هەڵکەوێ لێی دەداو دەیڕەنجێنێ، یا کەسی‌تر رادەسپێرێ کە لێی بدا.
**هەشتەم**- ئەوەیە کە مافی ڕەوای بەجێ‌نەهێنی و سەردانی نەکا و قەرزەکەی نەداتەوە و گەردن ئازادی لێ نەخوازی.

کەواتە، گەر کەسێک بێ کە دینداری بە سەریدا زاڵ بێ و هیچ کارێک نەکا کە تووشی گوناح بێ، بۆی هەیە کە لە چاکەی خۆی بێبەشی کا و ئاوری لێ نەداتەوە و لە گەڵی یادی خودا نەکا و لە دوعا و نزای بەخێری خۆی بێوەری کا. ئەمەش دەبێتە هۆی زیان بۆ پلە و پاگەی و تووشی خەساری زۆری دەکا. وەکوو مێستەح(مسطح) کە خزمی ئەبووبەکر بوو، لە کارەڕهاتی بوختان بۆ عایشەدا قسەی کرد و ئەبووبەکر کە پێشتر خەرجی پێ دەدا، سوێندی خوارد کە چیدی هیچی پێ نادا، ئەم ئایەتە هاتە خوارێ:أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ[1] واتە سوێند مەخۆن کە چاکە ناکەین لە گەڵ کە-سێک کە خراپەی لە گەڵ کردین. مەگین پێتان خۆش نییە کە پەروەردگار بتانبوورێ؟ ئەبووبەکر گوتی:«سوێند بەخوا کە پێم‌خۆشە». دیسان خەرجی پێداوە.

کەواتە هەرکەس رکی لە کەسێک هەڵگرت، لەم سێ دۆخە بەدەر نییە: یان لە گەڵ خۆی ململانێ دەکا تا چاکەی لە گەڵ بکا و زۆرتر سەرنجی بداتێ، ئەمە پلەی راستانە ؛ یاخۆ چاکە ناکا و خراپەشی لە گەڵ ناکا، ئەمە پلەی پارێزکارانە؛ یا هیچ چاکە ناکا، لە هیچ خراپەیەکیش خۆی لا نادا، ئەمەش پلەی خراپکاران و ستەمکارانە. هیچ چاکەیەک گەورەتر لەوە نییە کە وەڵامی خراپەی کە-سێک بە چاکە بدەریتەوە؛ گەر ناتوانی، بیبوورە، کە لێبوردن زۆر بەرز و هێژایە.

پێغەمبەر فەرمووی:«سێ شت هەیە کە دەتوانم سوێندی لە سەر بخۆم: یەکەم ئەوەی کە هیچ سامانێک بە سەدەقە بە فێرۆ ناچێ؛ هیچ کەس نییە کە لە کەسێک ببوورێ و پەروەردگار لە دوارۆژدا سەرتری و هێژایی زۆرتری پێ نەدا؛ سێیەم، هیچ کەس نییە کە دەرگای دەرۆزەیی و پارسەکی بە سەرخۆیدا بکاتەوە و خوداش ئەو دەرگایە بۆی دانەکردبێ». عایشە دەڵێ:« چجار نەمبینی پێغەمبەر

---

[1] -( قورئان، ٢٢/٢٤). ئەمرۆ گازندە و لەسەر نەماوە؛ خودا خەتاتان دەپۆشێ. (هـ)

کەسێک بە بۆنەی خۆیەوە سزا بدا، بەڵام گەر کەسێک لە مافی خودا لای بدایە، لە رادەبەدەر تووڕە دەبوو. گەر بۆ هەڵبژاردنی دوو ئەرک بۆ خەڵکی سەربەست بایە، ئاسانترین کاری بۆ خەڵکی هەڵدە-بژارد، مەگین ئەوەی کە گوناح بایە». عەقبەی کوڕی عامر دەڵێ: «پێغەمبەر دەستی گرتم و فە-رمووی: "دەتەوێ ئاگادارت کەمەوە کە هێژاترین ئاکاری خەڵکی دونیا و دوارۆژ چییە؟ ئەوەیە کە هەرکەس لێت دابڕا، تۆ بڕۆیتە لای، هەرکەس بێبەشی کردی، تۆ بەشی بدەی، هەرکەس ستەمی لێ کردی، تۆ بیبووری"».

پێغەمبەر فەرمووی کە مووسا گوتی:«پەروەردگار! کام یەک لە بەندەکانت هێژاترن لە لای تۆ؟» فەرمووی: «ئەو کەسەی کە هەرچەن هێز و توانی بێ، بەڵام بتوانێ ببوورێ». هەروەها مووسا گوتی:« هەرکەس دوعا و نزای شەڕی بۆ ستەمکار کرد، مافی خۆی وەرگرتووە».

کاتێ پێغەمبەر مەکەی گرت و دەستی بەسەر قورەیشدا راکێشا، قورەیش و مەکە -کە زۆریان ئازار بە پێغەمبەر گەیاندبوو- زۆر دەترسان و چاوەڕوانی کوژران بوون. پێغەمبەر دەستی لە سەر دەرگای کەعبە دانا وگوتی: «خوا یەکێکە و ئامبازی نییە، بەڵێنی خۆی بەجێهێنا و بەندەی خۆی سەرخست و دوژمنانی خۆی تێکشکاند، چ دەبینن و چ دەڵێن؟» گوتیان: «بێجگە لە چاکە چی بڵێین؟ چاومان لە بەزەیی ودلۆڤانی تۆیە. ئەمڕۆ دەستی باڵادەست هی تۆیە». گوتی: «ئەمڕۆ من ئەوە دەڵێم کە یووسفی برام پاش سەرکەوتنی بەسەر براکانیدا پێیانی گوت: لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ [1]». هەمووی دڵنیا کرد و گوتی کەس کاری پێتان نییە.

پێغەمبەر فەرمووی کاتێ خەڵک لە سارای مەحشەردا کۆوە دەبن، جاڕبێژ بانگ دەکا «رابن ئەوانە-ی لە خەڵکی بوردوون، پاداشیان لە لای پەروەردگارە». چەنایچەن هەزار خەڵک رادەبن و بەبێپرسینەوە دەڕۆنە نێو بەهەشتەوە، چونکە لە خەڵکی بوردوون.

مەعاویە دەڵێ: «لە تووڕەییدا پشوودرێژ بن تا هەلی زۆرترتان بێ، کە هەلتان بوو و بەهێزتر بوون، ئەو دەم ببوورن و رابوورن». یەکێکیان هێنایە لای هوشام کە خەیانەتی کردبوو؛ خەریکی بەڵگە هێنانەوە بوو. هوشام لێی تووڕە بوو، گوتی:«شەرەقسەم لە گەڵ دەکەی؟» گوتی: « پەروەردگار دە-لێ، يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَٰدِلُ عَن نَّفْسِهَا [2]، لە لای خوا دەتوانین پاکانە بۆ گوناحانمان کەین، بۆچی لە لای تۆ نەتوانین؟» گوتی:«وەرە، هەرچی دەتەوێ بیڵێ».

شتێکیان لە ئیبنی مەسعود دزی. خەڵکی لەحنەتیان بۆ دزە دەنارد. گوتی:«خوایا! ئەگەر نیازی پێ بووە و بۆیە بردوویە، بە پیرۆزی بێ! گەریش تەنیا بۆ گوناحکردن بردوویە، دواین گوناحی بێ!»

١ - قورئان، ١٢/٥٢.

٢ -( قورئان،١١١/١٦) لەو رۆژەدا کە هەرکەسێک هەر تەنیا کێشەی خۆیەتی و هەرکەس بەپێی کردەوەی خۆی. (هـ).

فوزەیلی عەیاز دەڵێ: «پیاوێکم بینی لە کاتی تەوافدا زرێیەکەی دزرا بوو؛ بە کوڵ دەگریا. گوتم: "ئەوە بۆ زرێکەت وا دەگری؟" گوتی: " نە، بەڵکوو هاتە پێش چاوم کە لە دوارۆژدا لە ئاستی من ڕاوستاوە و هیچ پاکانەیەکی نییە، بەزەییم پێیدا هاتەوە"».

تاقمێ لە دیلەکانیان بردە لای عەبدولمەلیکی مەروان. یەکێک لە گەورەکان پێی گوت: «پەروەردگار ئەوەی زۆرت پێخۆش بوو، پێی دای؛ واتە، سەرکەوتن. تۆش ئەوەی ئەو زۆری پێخۆشە پێی بدە؛ واتە لێبوردن».

لە ئینجیلدا هاتووە کە: «هەرکەس لەلای خودا تکا بۆ زاڵمی خۆی بکا، شەیتان لە بەری هەڵدێ». کەواتە دەبێ کاتی تووڕە بوون، ببورێ و لە هەڵسوکەوتیدا نەرم و نیان بێ تا تووڕەیی بە سەریدا زاڵ نەبێ. پێغەمبەر گوتی: «ئەی عایشە! هەرکەس لە نەرم و نیانی بەشی درا، بەهرەی خۆی لە دین و دونیا وەرگرت و هەرکەسەش بێوەر کرا، لە خێری دین و دونیا بێبەش کرا». دیسان فەرمووی: «پەروەردگار میهرەبانترینە و میهرەبانی خۆش دەوێ و ئەوەی بە میهرەبانی دەیدا، قەد بە تووڕەیی نایدا».

عایشە گوتی: «لە هەموو کارتاندا میهرەبان و نەرم و نیان بن، لە هەر کارێکدا نەرم و نیانی بوو، ئەو کارە دەخەملێتەوە و هەرکاریش کە میهرەبانی تێدا نەبێ، ئەو کارە کرێت دەبێ».

## ئێرەیی بردن

### شرۆڤەی ئێرەیی بردن وزیانەکانی

بزانە، لە تووڕەیی، ڕکوقین دێتەدی و لە ڕکوقین، ئێرەیی. ئێرەیی لە دەردە گورچکبڕەکانە[1]. پێغەمبەر فەرمووی: «چۆن ئاور هێزمی وشک هەڵدەلووشێ، ئێرەیی کردەوەی چاک دەسووتێنی». هەروەها فەرمووی: «لە نێو ئێوەشدا شتێک دێتەدی کە هەزاران نەتەوەی بەر لە ئێوەی فەوتاند، ئەوەش ئێرەیی و دوژمنی و ناکۆکییە. سوێند بەو خودا کە گیانی محەممەدی لە دەستدایە، تا باوەڕتان نەبێ نارۆنە نێو بەهەشتەوە و بڕواتان نابێ تا یەکترتان خۆش نەوێ. پێتان دەڵێم چۆن دەتوانن یەکتان خۆش بوێ: بە ڕاشکاوی سلاو و درووود بۆ یەک بنێرن».

مووسا کابرایەکی لە سای عەرشدا بینی، ئاواتەخوازی پلە و پاگەی ئەو بوو و گوتی: دیارە ئەوە زۆر هێژایە لە لای خوا و پرسی: ئەمە کییە وناوی چییە؟ [پەروەردگار] ناوی پێ نەگوت، بەڵام گوتی: لە چەندوچوونی هەڵسوکەوتی ئاگادارت دەکەمەوە. قەد ئێرەیی نەبردووە و لە قسەی دایک و بابی لای نەداوە و دووزمانی نەکردووە».

زەکەریا گوتی: پەروەردگاری مەزن دەڵێ:« ئێرەییبەر دووژمنی نیعمەتەکانی منە و لە ویستی من

---

[1] - گورچکبڕ: مەترسیدار.

تووڕە دەبێ و ئەوەی کردوومەتە بەشی بەندەکانم، ئەو پێی ناخۆشە».

پێغەمبەر فەرمووی:«شەش گرووپ بە شەش گوناح، بێپرسینەوە دەڕۆنە دۆژەهەوە: خونکاران بە ستەم، عارەب بە دەمارگیری، دەوڵەمەندان بە لووت بەرزی، بازرگانان بە دوخمانی[1]، لادێیی بە نەزانی و زانایان بە ئێرەیی».

ئەنەس دەڵێ: «ڕۆژێک لە لای پێغەمبەر دانشتبووم، فەرمووی:"هەنووکە کەسێکی بەهەشتی دێتە ژوورەوە". کابرایەک لە ئەنسار(انصار) هاتە ژوورەوە، پێڵاوەکانی لە دەستێکیدا بوو و ئاوی لە ردێن دادەچۆڕی، دیار بوو دەستنوێژی گرتووە. ڕۆژێکیتر دیسان هەر ئەمەی گوت و هەمان کابرا هاتە ژووری. تا سێ ڕۆژ هەروا بوو. عەبدوڵڵای کوڕی عەمروعاس ویستی بزانێ کردەی ئەم پیاوە چییە. ڕۆییە لای و گوتی لەگەڵ دایک و بابم بە شەڕ هاتووم، دەمەوێ سێ ڕۆژ لەلات بمێنمەوە. گوتی بەخێر بی. هەرچی سەیری کرد لەو سێ شەوەدا هیچ کردەیەکی بەرچاوی لێ نەدی، بێجگە ئەوەی کە لە خەو ڕادەبوو، یادی خودای دەکرد. بۆیە ناچارگوتی: برا! لەگەڵ دایک و بابم بەشەڕ نەهاتووم، بەڵام پێغەمبەر لە مەڕ تۆ وای فەرموو، ویستم بزانم کردەت چییە. گوتی: هەر ئەوەی کە دیوتە و بێجگە ئەوە هیچ. کاتێ ویستی بڕوا، گاسی گرد و گوتی شتێک هەیە: هەرگا کەسێک شتێکی پێگەشتبێ، قەد ئێرەییم پێ نەبردووە. عەبدوڵڵا گوتی: کەواتە، ئەم پلە وپاگەت هی ئەمەیە».

جارێک عەون کوڕی عەبدوڵڵا، ئاموژگاری پادشایەکی دەکرد. گوتی:«خۆت لە لووتبەرزی بپارێزە، چونکە یەکەم نافەرمانییەک کە لە ئاست خودا کرا، بە هۆی لووتبەرزیوە بوو، شەیتان بەبۆنەی خۆبەزلزانیوە بوو کە کڕنۆشێ لە ئادەم نەبرد. هەروەها دووربگرە لە چاونەزێری، چونکە هەر ئەوە بوو بە هۆی دەرکردنی ئادەم لە بەهەشت. دوور بە لە ئێرەیی، چونکە یەکەم جار بە هۆی ئێرەییوە بوو کە برا خوێنی برای ڕژاند، ئەوەش[قابیل]کوڕی ئادەم بووکە خوێنی برای[هابیل] ڕژاند. هەروەها کاتێ باسی یارانی پێغەمبەر یا دانستەکانی پەروەردگار یاخۆ باسی ئەستێران دەکەن، بێدەنگ بەو گوێ ڕاگرە».

بەکر کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: «کابرایەک بوو کە لە لای پادشا ڕێزو حورمەتێکی چاکی بوو. هەر ڕۆژ کە لە خەو هەڵدەستا دەیگوت: "لەگەڵ چاکەکار چاکە بکە و خراپکاریش، خراپییەکەی خۆی بۆی بەستە، کردەوەی خۆی بۆخۆی دەگەڕێتەوە، وازی لێ بینە". پادشا بە بۆنەی ئەم قسەوە زۆری خۆش دەویست. یەکێک ئێرەیی پێدەبرد، بە پادشای گوت کە فلان کەس دەڵێ پادشا دەمی بۆنی پیسی لێ دێ. پادشا گوتی: بەڵگەت چییە؟ گوتی:" بانگی کە لای خۆت، دەبینی کە دەست بە بینیەوە دەگرێ تا بۆنی دەمت نەبیسێ". پاشان هات و کابرای برد بۆ ماڵی خۆیان و چێشتێکی بۆ لێنا کە

---

[1] - دوخمانی: خەیانەت

سیری تێدا بوو. بەیانی پادشا گاسی کردە لای خۆی. کابرای چونکە دەمی بۆنی سیری دەهات، دەستی بە دەمیەوە گرت. پادشا پێی وا بوو کابرا راستی گوتووە.

پادشا هەرگا بیویستایە خەلاتێکی گەورە و مەزن بداتە کەسێک، بە دەستی خۆی بۆی دەنووسی. بۆیە بەدەستی خۆی نامەیەکی بۆ یەکێک لە نوکەرانی نووسی کە "هەڵگری ئەم نامەیە ببە وسەری ببڕە و کەوڵی پڕ لە کا کە و بۆمی بنێرەوە".نامەکەی مۆرکرد و دای بە کابرا. کە هاتە دەرەوە کابرای ئێرەییبەر چاوی پێکەوت کە بە کەیفە. گوتی: "چ بووە؟" گوتی: "پادشا خەلاتێکی مەزنی پێداوم". گوتی: بیدە بە من زۆرم پێویستە". گوتی: "بۆ تۆ". لێی وەرگرت و بردی بۆ نۆکەری پادشا. خولام گوتی: "لێرەدا نووسراوە کە سەرت ببڕم و کەوڵت پڕ لە کا بکەم و بینێرمەوە بۆ پادشا". کابرا گوتی: "دەست راگرە، ئەوە هی کەسێکیترە نەک من. بیگێڕەوە بۆ پادشا". خولام گوتی: "فەرمانی پادشا گێڕانەوەی بۆ نییە". سەری بڕی وکەوڵی پڕلە کا کرد. رۆژی دوایی کابرای چاکەکار، بێوەی گەرایەوە لای پادشا و هەمان قسەی کردەوە[1]. پادشا پێیسەیربوو، گوتی: "نامەکەت چی لێ کرد؟" کابرا گوتی: "فلان کەس داوای لێ کردم بیدەم بەو، منیش بەوەم بەخشی". پادشا گوتی: "ئەو کابرایە بە منی گوت کە تۆ ئاوەها شتێکت پێ گوتووم". کابرا گوتی: "من نەمگوتووە". گوتی: "دەی بۆچی دەست بە بینتەوە گرت؟" گوتی: "ئەو کابرایە چێشتێکی پێ دام کە سیری زۆری تێکردبوو، دەستم گرت بە دەممەوە تا بۆنی ئێوە نەرەنجێ". پادشا گوتی: "دەسا برۆ و لە سەر ئەو قسەیەت بەردەوام بە و چاکە لە گەڵ چاکەکار بکە وخراپکاریش خراپیەکەی تووشی دەکا. ئەو پیاوەشی تووش کرد"».

ئیبنی سیرین دەڵێ: «بە بۆنەی دونیاوە، ئێرەیم بە کەس نەبردووە؛ چونکە گەر بەهەشتی بێ، دونیا لە چاو ئەو نیعمەتەی دوارۆژ هەیەتی، چ بایەخێکی هەیە؟ گەریش جەهەننەمی بێ ئەم نیعمەتە چ کەڵکێکی بۆ هەیە کە تووشیاری ئاوری دۆژەهەدی ؟»

یەکێک لە حەسەنی بەسری پرسی: «بڕوادار ئێرەیی دەبا؟» گوتی: «مەگین کوڕەکانی یەعقووبت لە بیر نەماوە؟ ئەری، بڕوادار ئێرەیی دەبا، گەر تەنیا رەنجێک بێ لە نێو سینەیدا و لە کردەوەیدا پیشانی نەدا، زیانی نییە». بوودەردا گوتی:«هەرکەس زۆر یادی مردن بکا، نە شاد دەبێ نە ئێرەیی دەبا».

### باس لە راستەقینەی ئێرەیی

بزانە، ئێرەیی ئەوەیە کە نیعمەتێک بگاتە کەسێک و تۆ پێت ناخۆش بێ و تامەزرۆی فەوتانی ئەو

---

[1] - مەبەست: لە گەڵ چاکەکار چاکە بکە و...

نیعمەتە بێ. ئەمەش بە پێی ئەخبار حەرامە؛ چونکە هەم بە درێو زانینی رەزای خودایە و هەمیش مایەی دەروونپیسیە ؛ نیعمەتێک کە بۆ تۆ نابێ، گەر داوای فەوتانیکەی، بێجگەی دەروونپیسی هۆیەکی نییە. بەڵام گەر پێت خۆش بێ کە تۆش شتێکی وەک ئەوەت بێ و هی ئەو کەسەش نەفەوتێ، ئەمە کرێت نییە، بەڵکوو پێی دەڵێن ئاواتەخوازی[1]. گەر ئەمە لە کاری دینیدا بێ، شیاو و لەبارە و تەنانەت دەتوانین بڵێین فەرزە. پەروەردگار دەڵێ: وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ[2]، هەروەها گوتی: سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ[3]؛ واتە: پێکەوە رکە بەری کەن.

پێغەمبەر فەرمووی: «ئێرەیی نییە مەگین لە دوو شتدا: یەکەم پیاوێک کە پەروەردگار زانست و سامانێکی زۆری پێ دابێ، سامانەکەی بە گوێرەی زانستەکەی لە رێی خوادا خەرج بکا و کەسێکیتر کە پەروەردگار زانستی پێ دابێ و سامانی پێ نەدابێ و ئاوات بخوازێ کە "گەر منیش سامانم هەبوایە، هەر بۆ جۆرەم خەرج دەکرد"، ئەم دوو کەسە لە پاداشدا بەرانبەرن. گەر سامانەکەی لە کاری خراپدا خەرج بکا و ئەویتر بڵێ گەر منیش بمبایە هەروام خەرج دەکرد، هەر دوویان لە گوناحدا بەرانبەرن؛ ئەم تامەزرۆییە، ئێرەییشی پێ دەڵێن؛ بەڵام لەمەدا هیچ نیعمەتێک بە کرێت نازانرێ». رەوانییە هیچ نیعمەتێک بە کرێت بزانرێ و ئاواتەخوازی فەوتانی بی، بێجگە نیعمەتێک کە درابێتە خراپکارو ستەمکارو ئەو نیعمەتەش هۆکاری بەردەوامی گەندەڵی و زۆر و ستەمی بێ: رەوایە گەر نەمان و فەوتانی ئەو نیعمەتەت ئاوات بێ، چونکە لە راستیدا ئەوە نەمانی نیعمەت نییە، بەڵکوو نەمانی ستەمکار وخراپکارە. نیشانەکەشی ئەوەیە کە گەر ئەو کەسە پاشگەز بێتەوە لە خراپیەکانی، ئەو بە کرێت زانینی نیعمەتەش نامێنێ. لێرەدا خاڵێکی ورد هەیە: ئەوەش ئەوەیە کە گەر کەسێک نیعمەتێکی پێ بدرێ و کەسێکیتر ئاواتەخوازی ئەو نیعمەتە بێ، گەر نەیبێ، رەنگە ئەو جیاوازییە بە درێو بزانێ. کەواتە، رەنگە نەمانی ئەو جیاوازییە -بە فەوتانی ئەو نیعمەتە- دڵی هێور کاتەوە. سروشتی مرۆڤ لەم ئاواتانە خاڵی نییە، بەڵام چونکە ئەم حەزەی بە درێو و کرێت دەزانێ و گەر دەستەڵاتی ئەوەی هەبایە ئەو نیعمەتە بفەوتێنی، نەیدەفەوتاند، بە بۆنەی ئەو شتەی کە لە دڵیدایە، لێی ناپرسنەوە و ئازاری نادەن.

## شرۆڤەی دەرمانی ئێرەیی

ئێرەییش نەخۆشیەکی گەورەیە بۆ دڵ و دەرمانەکەشی ماجوونێکە لە زانست وکردەوە. زانست ئەوەیە کە بزانێ ئێرەیی زیانی ئەوە لە دونیا و پەسلاندا و لە دوارۆژیشدا قازانجی ئەو کەسەی تێدایە

---

1 -ئاواتەخوازی: غبطە.

2 - (قورئان، ٢٦/٨٣ )

3 - ( قورئان، ٢١/٥٧ )

کە ئێرەیی پێ براوە.

زیانی لە دونیا بریتییە لەوەی کە هەردەم تووشیاری خەم و پەژارە و دەرد و کەسەرە، چونکە هەردەم کەسێک هەیە کە نیعمەتێکی پێدرابێ و بەمنەدرابێ. هەروەک چۆن دەیەوێ کە دووژمنی تووشی ئازار بێ، خۆی بەو دەردە دەڕوا و تووشی رەنج وسزا دێ؛ هیچ رەنج و سزایەک گەورەتر و گورچکبڕتر لە ئازاری ئێرەیی‌بردن نییە. کەواتە، چ بێ ئاوەزییەکە کە خۆت بە بۆنەی دوژمنتەوە تووشی ئازار کەی و ئەو ئێرەیی بردنەت هیچ ئازارێ بەو نەگەیێنێ؛ ئەو نیعمەتە مۆڵەتێکی هەیە لە تەقدیری پەروەردگاردا کە نە دێتە بەرەوە ونە دەڕواتە دواوە و نەکەم دەبێ و نە زۆر. ئەم چارەیە کە پەروەردگار نووسیویە هەندێ کەس پێی دەڵێن بەختی چاک. گرینگ نییە چی پێی دەڵێن، گرینگ ئەوەیە هەموو زانایان رایان وایە کە گۆڕانی بۆ نییە. بەم بۆنەوە کە یەکێک لە پێغەمبەران تووشی هاتبووە تووشی ژنێکی دەسەڵاتداری ستەمکارەوە. زۆر لە لای پەروەردگار پاڕایەوە و گلە و گازندەی کرد. وەحی بۆ هات کە «فَرَّمن قُدّامها حَتّی تَنقَضیَ اَیّامُها»، واتە: لە بەری هەڵبێ تا مۆڵەتی دوایی بێ، چونکە ئەو مۆڵەتەی لە ئەزەڵەوە دیاری کراوە، چجار ناگۆڕدری. یەکێک لە پێغەمبەران تووشی بەلا هاتبوو، زۆر پاڕایەوە. وەحی بۆ هات کە «ئەو رۆژەی کە چارەنووسی زەوی و ئاسمانەکانم نووسی، بەختی تۆ واهات، چ دەڵێی؟ بەبۆنەی تۆوە سەرلە نوێ چارەنووسەکان بنووسمەوە؟»

گەر کەسێک پێی خۆشە کە بە ئێرەیی‌بردنی ئەو نیعمەتی کەسێک بفەوتێ، زیانی خۆیشی تیدایە، چونکە بە ئێرەیی‌بردنی کەسێکی‌تر، نیعمەتی خۆی دەفەوتێ و بە ئێرەیی کافران، نیعمەتی باوەڕی خۆی دەفەوتێ، هەروەک پەروەردگار فەرمووی: وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يُضِلُّونَكُمۡ[1].

کەوابوو، ئێرەیی‌بردن، خۆی بە نەخت ئازاری ئێرەیی بەری تێدایە.

بەڵام زیان وخەساری دواڕۆژ زۆرترە، چونکە بە رەزای پەروەردگار نارەزایەو حەز بە نەبوونی شتێک دەکا کە خودا بە هۆزانی خۆی بەدی‌هێناوە و کەس لە نهێنی ئەو بوونە ئاگەدار نییە. لە بەرانبەر تاکپەرستیدا چ خەیانەتێک لەمە زۆرترە.

قازانجی دونیایی ئێرەیی بۆ ئێرەیی لێبراو ئەوەیە کە دوژمنەکەی بەردەوام لە نێو ئازارو ئاوری رەنجدا دەسووتێ و چ ئازارێک خراپتر لە ئێرەیی؟ هیچ ستەمکارێک وەکوو ئێرەییبەر، ستەمی لێناکرێ. ئێرەیی‌لێبراو گەر تێبگا کە ئێرەییبەرەکەی مردووە، دڵتەنگ دەبێ، چونکە ئەو کەسە لە ئاوری ئێرەیی رەستووە؛ کەچی ئەو پێی‌خۆشە هەمووکات لە نێو نیعمەتدا بێ و تۆش لە نێو ئازاری ئێرەییدا بژی.

---

١ - (قورئان، ٦٩/٣) هێندێک لە خاوەن کتێبان بە تەمابوون ئێوە لە ڕێ کلا بکەن (هـ).

بەڵام قازانجی بۆ دوارۆژ، چونکە بەهۆی ئێرەییبردنی تۆوە ستەمی لێکراوە و ڕەنگە بە زمان یان کردەوە، تووشی ئازارت کردبێ و بەم بۆنەوە چاکەکانی تۆ بۆ ئەو نووسراوە و گوناحانی ئەو دەخرێنە نێو دیوانی تۆوە. ویستت نیعمەتی دونیای بفەوتێ، نەتەنیا نەفەوتا، بەڵکوو نیعمەتی دوارۆژیشی زۆرتر بوو و ئەم دونیایەت پڕ بوو لە ئازارو بناغەی چارەڕەشی دوارۆژی خۆتت دارشت.

پێت وابوو دۆستی خۆتی و دوژمنی ئەو، کەچی لە ڕاستیدا دوژمنی خۆت بووی و دۆستی ئەو؛ خۆت دەخەیتە ئازار و گەورەترین دوژمنت -کە شەیتانە- شاد و بەکەیف دەکەی. شەیتان کە تۆی بینی لەم دونیایە لە نیعمەتی زانین و پارێزکاری پلەوپاگە وماڵ وسامان بێبەشی، ترسا گەر پێی ڕەزا بی، پاداشی دوارۆژت بەرکەوێ؛ بۆیە ویستی پاداشی دوارۆژت بفەوتێنێ وفەوتاندی. هەرکەس زانا و پارێزکارانی خۆش بوێ وبە ماڵ وسامانیان ڕەزا بێ، لە پەسلاندا لە گەڵ ئەوانە، هەرچەن خۆی هیچ بەهرەی لێ نەبردبێ. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس کەسێکیتری خۆش بوێ، لە دوارۆژدا لەگەڵ ئەو دەبێ». دەڵێن پیاو ئەو کەسەیە کە یان زانا بێ، یان خوێندکار بێ و یان خۆشەویستی ئەوانە. ئێرەییبەر لە هەر سێکی ئەمانە بێوەرییە. چیرۆکی ئێرەییبەر وەکوو ئەو کەسەیە کە بەردێک بۆ دوژمنەکەی دەهاوێژێ و ئەو بەردە کەمانە دەکا وهیچ کابرا ناپێکی، دەگەڕێتەوە دەدا لە چاوی ڕاستی کابرا و کوێری دەکا. کابرا تووڕەتر دەبێ و بەردێکیتر دەهاوێژێ، ئەمیش هەروا، نەتەنیا دوژمنەکەی ناپێکێ، دەگەڕێتەوە و چاوی چەپیشی کوێر دەکا. کابرا هەروا بەرد دەهاوێژێ و بەردەکان سەروگوێلاکی خۆی دەکوتن و توخنی ئەویتر ناکەون. دوژمنانی دەیبینن و پێی پێدەکەنن. ئەمە ڕۆژی ئێرەییبەرە کە خۆی کردۆتە گەپچاڕی شەیتان. ئەمانە هەموو زیانی ئێرەیین.

گەر کار بکێشێتە ئەوەی کە بە دەست و زمان دەسدرێژی و خوسپە و درۆ و حاشا لە ڕاستی کا، سزای ئەوە گەلێک زۆرە و لە ژمار نایە. کەواتە هەرکەس تێگەیشت کە ئێرەیی ژاری کوشندەیە بۆی، گەر ژیر و خاوەن ئاوەز بێ، تا دەتوانێ خۆی لێ دەپارێزێ.

دەرمان بە کردەوە، ئەوەیە کە بە کۆشەوە هۆکانی ئێرەیی لە خۆی دوور بکاتەوە، هۆکانی ئێرەیی، لووتبەرزی و دەمارزلی و دوژمنی و ماڵدۆستی و شتی لەم چەشنەیە -هەروەک لە واتای تووڕەییدا باسمان کرد- دەبێ ئەم بنج وبناوانە بە کۆشەوە بنەبڕکا و تێکیان بدا. ڕەوانکەر[1] ئەمەیە، گەر ئێرەیی نەهاتبێتە ئاراوە. بەڵام گەر هاتەکایەوە، هەرچی ئێرەیی گوتی بە ئاوەژووی ببزوێتەوە: کە گوتی «بیگرە بەر تیز وپلار»، پەسنی بکات، کە گوتی «لە گەڵی لووتبەرز بە»، خۆی بە خاکەساری پێشان بدا، گەر گوتی «هان بدە نیعمەتەکەی بفەوتێنی ودوژمنایەتی لە گەڵ کەی»، ببە بە یارمەتیدەری. هیچ دەرمانێ وەکوو ئەوە نییە کە لە پشتەسەریەوە پەسنی بکات و شانی بەرزکاتەوە تا ئەو ببیسێ و

[1] بۆیە پێی دەڵێ«ڕەوانکەر» چونکە وەکوو دەرمان کە بۆ ڕەوانکردنی سک بەکار دەبری ، بنج وبناوانی نەخۆشی دا دەماڵێ.

دڵی پێ خۆش بێ. کە دڵی خۆش بوو، تیشکی ئەو دڵخۆشیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی ئێرەیی بردووە و دڵی خۆی خۆش دەبی دوژمنایەتییەکی نامێنێ. هەروەک پەروەردگار فەرمووی: ٱدۡفَعۡ وَلَا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ[1]. لێرەدا شەیتان پێی دەڵێ گەر خۆت بە خاکەساری پیشان بدەی و ڕێزی لێ بگری، خەڵکی ئەمە بە ناتوانی و بێفەڕی تۆ دەزانن؛ جا تۆ سەربەستی، پێت خۆشە گوێ بۆ پەروەردگاری مەزن ڕاگرە، پێت خۆش نییە بۆ شەیتان.

بزانە ئەم دەرمانە زۆر بەکەڵک و قازانجە، هەرچەند گەلێک تفت وتاڵە. بە ئاستەم بتوانی لە سەر ئەم دەرمانە بەردەوام بی و پشوودرێژ بێ، مەگین بەهێزی زانین، کە بزانی ڕزگاری دین و دونیات لەوەدایە و فەوتانی دین و دونیات لە ئێرەییبردنە. هیچ دەرمانی بەبێپشوودرێژی بەسەر تاڵییەکەیدا کاریگەر نابێ و نابێ چاوەڕوانی ئاوەها دەرمانێ بی. کە نەخۆشی هات، دەبێ لەش خۆی بۆ ڕەنجی دەرمانی تفت وتاڵ تەیار کا، بە هومێدی چابوونەوە؛ ئەگینا نەخۆشی تەشەنە دەکا و ڕەنج وئازاری زۆرتر دەبێ.

**سەرنج**- بزانە، هەرچەن زۆریش ئازار بکێشی و هانیش بدەی، دیسان لە دڵدا لە نێوان ئەو کەسەی کە ئازاری پێگەیاندووی و ئەو کەسەی کە خۆشتی دەوێ، جیاوازی دادەنی و چاکە و خراپەی هەردووکیان یەکسان نییە؛ تەنانەت ڕەنگە بەگوێرەی سروشتت چاکەی دوژمنت پێ دزیو و کرێت بێ. تۆ ناچار نیت کە چۆنییەتی سروشتت بگۆڕی، چونکە ئەوە لە وزەی تۆدا نییە، بەڵام بۆ دوو شت ناچاری و دەبێ جێبەجێی کەی: یەکەم نە بە قسە و نە بە کردەوە پیشانی نەدەی، دووەم بە فام و ئاوەزت ئەم بارودۆخەی سروشتت پێ دزێو بێ وخوازیاری نەمانی بی. کە واتکرد، لە ئۆباڵی ئێرەیی خەلستووی. بەڵام گەر ئاشکرای نەکەی، کەچی بە دڵ لەم بۆچوونەی دڵت بێزار نەبی و بە دزێوی نەزانی، هەندێ دەڵێن کە گوناحبارنیت و لێت ناپرسنەوە. کەچی ڕاستییەکەی ئەوەیە کە گوناحە و لێتدەپرسنەوە، چونکە ئێرەیی کاری دڵە نەک لەش؛ هەرکەسیش ڕەنجی موسوڵمانێکی بوێ وبە ئازاری شاد بێ و بە شادی خەمبار بێ، بێشک لێی دەپرسنەوە و لە ئاست دڵی خۆی بەرپرسە؛ مەگین ئەم دانستەیە بە ناڵەبار بزانێ، ئەودەم دەخەلسێ. بەڵام بە گشتی کەسێک لە ئێرەیی ڕزگاز دەبێ کە تەوحید بە سەردڵیدا زاڵ بێ: کەس بە دۆست و دوژمن نەزانێ، بەڵکوو هەموو کەس بە بەندەی خوا بزانێ و هۆی هەموو کارێک بە یەک کەس بزانێ. ئەمە زۆر دەگمەنە: وەکوو برووسکە دێت و دەڕوا و زۆر بە دەگمەن سەقامگیربێ.

---

١ - (قورئان،٤١/٣٤) تۆ هەمیشە وەرامی چاکتر بدەوە، ئەوسا کەسێ کە لەگەڵ تۆدا دوژمنە، دەبێتە دۆسی نزیکت. (هـ).

## بنه‌مای پێنجم- ده‌رمانی خۆشه‌ویستی دونیا

## و

## شرۆڤه‌ی ئه‌مه‌ی که‌ هۆی هه‌موو گوناحێک خوشه‌ویستی دونیایه‌

بزانه‌ دونیا هۆی هه‌موو شه‌ڕێکه‌ وخۆشویستنی بناغه‌ی هه‌موو گوناحێکه‌. دونیا دوژمنی خودا و دوسته‌کانی و دوژمنی دوژمنه‌کانیه‌. بۆیه‌ دوژمنی خودایه‌ چونکه‌ ڕێگای به‌نده‌کانی ده‌بڕێ تا پێی نه‌گه‌ن؛ بۆیه‌ دوژمنی دۆسته‌کانیه‌ چونکه‌ واخۆی ده‌خه‌ملێنێ و ده‌ڕه‌نگێنێ که‌ دلیان ده‌خاته‌ له‌رزه‌ و بۆ ئه‌وه‌ی خۆیان لێی دوور بگرن، ده‌بێ تفت وتالی پشوودرێژی بچێژن؛ به‌لام دوژمنایه‌تی له‌گه‌ل دوژمنه‌کانی به‌م چشنه‌یه‌ که‌ به‌ گزی و فزی ده‌یانکاته‌ دۆستی خۆی و که‌ دلبه‌سته‌ی بوون، لێیان دوور ده‌گرێ وده‌خزێته‌ باوه‌شی دوژمنه‌کانیان و وه‌کوو ژنی خراپکار، له‌ لای ئه‌م پیاوه‌وه‌ ده‌خزێته‌ لای ئه‌و پیاوی‌تر، تا له‌م جیهانه‌دا یان ڕه‌نجی بوونی بێته‌ به‌شیان، یا ده‌رد دووری بکێشن، له‌ دواڕۆژیشدا تووشی تووڕه‌یی و ئازاری په‌روه‌ردگار بن. که‌س له‌ داوی ده‌رباز نابێ، مه‌گین ئه‌وه‌ی که‌ به‌راستی بیناسێ و له‌ ئافه‌ته‌کانی تێبگا و خۆی لێ ببوێرێ، به‌و چه‌شنه‌ی خۆی له‌ سیحرو جادوو ده‌پارێزێ، چونکه‌ پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووی:«خۆتان له‌ دونیا بپارێزن، چونکه‌ سیحربازتره‌ له‌ هارووت و مارووت».

ڕاسته‌قینه‌ی دونیا و گزی و فزی و ئافه‌ته‌کانی له‌ سه‌ردێڕی سێیه‌می سه‌ره‌تای ئه‌م کتێبه‌دا بێژرا. لێره‌دا ئه‌خبارێک که‌ خراپه‌ و لۆمه‌ی دونیایان کردووه‌، ده‌گێڕینه‌وه‌، ئایه‌ته‌کانی قورئان له‌م بابه‌ته‌دا زۆرن. مه‌به‌ستی قورئان و سه‌رجه‌می کتێبی پێغه‌مبه‌ران و ناردنی پێغه‌مبه‌ران بۆ ئه‌وه‌یه‌ که‌ خه‌لکی له‌ دونیاوه‌ به‌ره‌و دواڕۆژ گاس بکه‌ن و ئافه‌تی دونیا و به‌لا و مێملی بۆ خه‌لک بگێرنه‌وه‌ تا لێی دوور بگرن.

**شرۆڤەی ئافەتی دونیا ولۆمەی دونیا بە گوێرەی ئەخبار**

جارێک پێغەمبەر بە سەر مەڕێکی مردارەوبوودا تێپەڕی، گوتی: «دەبینن کەئەم مردارە چەن بێبایەخ و سووکە و کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە؟ سوێند بە خودایەک کە گیانی محەممەدی لە دەستدایە! دونیا لە لای پەروەردگار سووکتر لەمەیە. گەر بە قەدەر باڵی مێشوولەیەک بایەخی بایە، بە هیچ کافرێک قومە ئاوێکی نەدەدا». هەروەها گوتی: «دونیا لەحنەت لێکراوە و هەرچی تێدایە، لەحنەت لێکراوە، مەگین ئەو شتەی کە بۆ خودا بێ». هەروەها گوتی: «خۆشەیستی دونیا، سەرچاوەی هەموو گوناحەکانە». هەروەها فەرمووی: «هەرکەس دونیای خۆش بوێ، دواڕۆژی دەفەوتێ، هەرکەسەش دواڕۆژی خۆش دەوێ، دونیای بە زیان دەدا. کەواتە، ئەوەی دەمێنێتەوە هەڵدەبژێرێ و ئەوەی نامێنێ دەهێڵتەوە».

زەید کوڕی ئەرقەم دەڵێ: لەگەڵ ئەبووبەکر بووم، ئاویان بۆ هێنا بە هەنگوین شیرین کرابوو. کە نزیکی دەمی کردەوە، گێڕایەوە و دایە پرمەی گریان، ئەوەندە گریا تا هەموومان ئاو لە چاوانمان هاتەخوار. پاشان بێدنگ بوو. دیسان خەریکی گریان بوو، ئەوەندە گریا کەس نەیدەوێرا هۆی گریانەکەی بپرسێ. کاتێ ئەسرینی چاوانی سڕی، گوتیان: «چ بوو ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا؟» گوتی: «ڕۆژێک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دانشتبووین، دیم کە بە دەستی خۆی شتێک لە خۆی دوور دەکاتەوە، بەلام من هیچم نەدەدی. گوتم: ئەوە چییە پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: "ئەوە دونیایە خۆیم پێ دەنوێنی؛ لە خۆمی دوور دەکەمەوە، دیسان دەگەڕێتەوە و دەڵێ: گەر تۆ لە دەستم ڕەستی، ئەوانەی پاش تۆ دێن، لێم دەرباز نابن"، ئێستا ترسام کە دونیا دەستی بە سەرمدا گرتبێ».

پێغەمبەر فەرمووی:« پەروەردگار هیچ شتێکی نەخولقاند کە بە قەدەر دونیا بێزی لێ بێ. کاتی ئافراندی سەیرێکێشی نەکرد». دیسان گوتی: «دونیا خانووی بێ خانووان و سامانی بێ سامانانەو کەسێک کۆی دەکاتەوە کە بێئاوەزە و تەنیا خەڵکی گێل ونەزان لە سەری شەڕ دەکەن. نەزانان ئێرەیی پێدەبەن وکەسێک بەدوویدا دەڕوا کە بێباوەڕە». دیسان گوتی: «هەرکەس بەیانی هەستێ و بیرو هۆشی لە لای دونیا بێ، ئەوە پیاوی خودا نییە. بەردەوام چوار شتی لە گەڵایە: خەمێک کە دوایی بۆ نییە، کارێک کە لێی نابێتەوە، هەژارێک کە قەد دارا نابێتەوە و هیوایەک کە قەد نایێتە دی».

ئەبووهورەیرە گوتی: «جارێک پێغەمبەر پێی‌گوتم: "دەتەوێ سەرلەبەری دونیات پێ‌بنوێنم؟" دەستی گرتم وبردمیە سەر زبڵدانێ کە ئێسقانی مرۆڤ و ئاژەڵ و جلوبەرگی دڕاو و پیس و پیسایی خەڵکی تێدا بوو، گوتی: "ئەی ئەبووهوورەیرە! ئەم سەرانە پڕ لە ئاوات و تامەزرۆیی بوون، وەکوو سەری ئێوە، ئێستا بوونەتە ئێسکی بێ پێست، زۆر نابا کە ببنەوە خاک. ئەم پیساییانە خۆراکی

هەمەجۆر و هەمەڕەنگ بوو کە بۆ بەدەستهێنانیان کۆشەوەی زۆریان کرد، کەچی ئێستا وا فڕێ دراون. ئەم جلکە پیسانە، جلوبەرگی زۆر جوان بوون ئێستا وا داکەوتوون و با دەیانشەکێنێتەوە. ئەم ئێسکانەش، ئێسکی چوار پێیەکانیان بوون کە سواریان دەبوون و خواروبانی جیهانی پێ دەگەڕان. ئەمە بوو نووک‌وبەدی جیهان. هەرکەس دەیەوی شینی بۆ بگێڕێ، بلێ بیگێڕە، چونکە جێگای شین گێڕانە". هەموو ئەوانەی کە لەوێدا بوون، بوون بە گریانەوە». پێغەمبەر فەرمووی: «لەو دەمەیڕا کە دونیا ئافرێنداوە لە نێوان زەمین وئاسماندا داسپێردراوە، چونکە خودا سەیری نەکردووە. لە پەسلاندا دەڵێ: "خوایا! بمدە بە ناچیزەترین بەندەکانت". دەڵێ: "وس بە ئەی بەدفەڕ! لە دونیادا نەمویست هی کەس بی، لێرە چۆن بمەوێ؟» هەروەها گوتی: «لە دوارۆژدا تاقمێک دێنن کە کردەیان چەن بەرانبەر کێوی تەهامەیە، هەموویان دەهاوێژنە نێو دۆژەهەوە». گوتیان: «نوێژ خوێنن ئەی پێغەمبەری خودا؟» فەرمووی:«نوێژ دەکەن و رۆژوو دەگرن و شەونخووینش دەکێشن، بەلام کە نەختێ لە دونیا دیاری دەدا، خۆیانی بۆ دەهاوێژن».

جارێک پێغەمبەر لە ماڵ هاتەدەر و بە یارانی گوت: «کام یەک لە ئێوە دەیەوێ کە کوێر نەبێ و پەروەردگار کوێری نەکا؟ بزانن هەرکەس حەزی لە دونیا بێ و ئاواتی دووردودرێژی بێ، پەروەردگار بەقەدەر ئەوە دڵی کوێر دەکا؛ هەرکەسیش کە لە دونیا پارێز بکا و ئاواتەکانی کەم بکا، پەروەردگار بەبێ فێرکاری، زانستی پێ فێر دەکا و بەبێ رێنما، رێگای بۆ ئاشکرا دەکا».

رۆژێک پێغەمبەر لە خانووی هاتەدەر. ئەبووعوبەیدەی جەڕڕاح لە بەحرینەوە ماڵێکی ناردبوو و ئەنسار ژنەفتوویان و لە کاتی نوێژی بەیانیدا ئاپۆرەیان بەستبوو. پاش دوایی هاتنی نوێژ هەموویان لە بەردەم پێغەمبەردا چۆکیان دا. پێکەنی و گوتی: «پێم وایە بیستووتانە کاروانێک هاتووە؟» گوتیان: «بەڵێ». گوتی:«مزگێنی بێ بۆتان کە کاروبارتان وا پێک دێ کە پێی شاد دەبن و خەمی هەژاریتان نامێنێ، بەلام لەوە دەترسم کە دونیا بڕژێنن بە سەرتاندا -هەروەک بەسەر کەسانێکدا رژا کە بەر لە ئێوە بوون- پاشان بۆ کۆوەکردنی ململانێ کەن -هەروەک پێشوونان وایان کرد- تا ئەوەی کە تەفروتوونا دەبن؛ هەروەک ئەوان بوون».

گوتی:«بەهیچ جۆرێ دڵ مەپەرژێننە سەر یادی دونیا». چ بگاتە ئەوەی کە خۆشتان بۆی. ئەنەس دەڵێ:«پێغەمبەر حوشترێکی بوو، غەزبایان پێی دەگوت، لە هەموو حوشترەکان خێراتر غاری دەکرد. رۆژێک عارەبێ حوشترێکی هێنا و لە گەڵی غاری دا: حوشتری عارەبەکە خێراتر بوو. موسوڵمانەکان دڵتەنگ بوون، پێغەمبەر فەرمووی: " بەراستی کە پەروەردگار هیچ شتێکی بەرز نەکردەوە کە بە زەوییندا نەدا"». دیسان دەڵێ: «لەمە بەدوا دونیا رووتان لێ دەکا و وەکوو ئاور هێزمی وشک دەسووتێنێ، دینتان دەسووتێنێ».

عیسا دەڵێ: «دونیا مەکەنە خودای خۆتان، تا نەتانکاتە بەندەی خۆی. گەنجێک هەڵبگرن کە بۆی نەترسن ولەلای ئەوەی دابنێن کە بۆتانی نەفەوتێنێ؛ چونکە گەنجی دونیا بێوەی نییە، بەڵام گەنجێ کە لەلای خودا دابنرێ، کەس توخنی ناکەوێ». هەروەها گوتی: «دونیا و پەسلان هەوەی یەکن؛ یەکیان خۆشحاڵ کەی، ئەویتریان زیز دەبێ». هەروەها گوتی: «ئەی یارانم! دونیام لە لاتان فڕێ دا، هەڵیمەگرنەوە؛ لە پیسی دونیا یەکێک ئەوەیە کە بە هۆی ئەوەوە تووشی نافەرمانی خودا دەبن. هەروەها کەس ناگاتە بەختەوەری دوارۆژ تا ئەوەی کە لەو دوورەپەرێز بێ. دووری‌لێبگرن و وازی لێ بێنن و خەریکی ئاوەدان کردنەوەی مەبن و سوور بزانن کە سەرچاوەی هەموو گوناحەکان خۆش-ویستنی دونیایە و زۆر ئارەزووی نەفس هەیە کە ئەنجامی خەموکەسەری دوورو درێژە». هەروەها گوتی: «هەروەک چۆن ئاو و ئاور پێکرا کۆوە نابن، خۆشەویستی دونیا و پەسلانیش لە یەک دڵدا کۆو نابن». بە عیسایان گوت: «چ دەبێ گەر بەرگێکی نوێ بۆ خۆت بکڕی؟» گوتی: «کۆنەی خەڵکی بۆمان بەستە».

رۆژێک بارانێکی بەخوڕ عیسای داگرت، هەڵات شوێنێ بۆ حەوانەوە ببینێتەوە. دەوارێکی دی، رۆیشتە ژوور، ژنێکی بینی، لەوێ هەڵات؛ ئەشکەفتێکی دی، رۆیشتە ژوورەوە؛ شێرێک لەوێدا بوو، لەوێش هەڵات. گوتی:«خوایا! بە هەر ئافرێندراوێکت پەناگایەکت دا، بێجگە لە من». وەحی بۆ هاتەخوارەوە کە: «پەسیو و پەناگای تۆ جێی بەزەیی منە -واتە بەهەشت- لە بەهەشتدا سەد حووری دەکەمە هاوسەرت کە بە دەستی بەزەیی خۆم ئافراندوومن؛ چوار هەزار ساڵ زەماوەندت بۆ دەگرم، کە هەر رۆژێکی چەن تەمەنی دونیایە و بە جاڕبێژ دەڵێم جاڕ بدا. کە "لە کوێن پارێزکارانی دونیا؟ هەمووتان بێن بۆ زەماوەندی عیسا" تا هەموویان بێن».

جارێک عیسا بە شارێکدا تێدەپەڕا، دی کە هەموویان لە ناو رێدا مردوون، گوتی: «ئەی دۆستان! ئەمانە لە بەر تووڕەیی خودا مردوون، ئەگینا لە ژێر خاکدا بوون». گوتیان: «دەمانەوی بزانین بۆچی مردوون». عیسا ئەو شەوە رۆیشتە سەر بەرزاییەک و بانگی کرد: «هۆ خەڵکی شار!» یەکێک وەرامی دایەوە کە: «بەڵێ ئەی رۆحی خوا». گوتی: «سەربهوردتان چییە؟» گوتی: «شەو لە نوێندا نووستبووین، بەیانییەکەی لە نێو هاویەدا بووین». گوتی:«بۆچی؟» گوتی: «چونکە دونیامان خۆش دەویست و گوناحبارانمان بەندەگی دەکرد». گوتی: «چۆن دونیاتان خۆش دەویست؟» گوتی: «بەو جۆرەی کە منداڵ دایکی خۆش دەوێ؛ کە دەهات شادو شوکر دەبووین، کە دەڕۆیشت خەمبار دەبووین». گوتی: «کەسانی‌تر بۆچی بێدەنگن؟» گوتی: «ئەوان هەریەکەو هەوسارێک لە ئاوریان لە دەمدایە». گوتی: «تۆ چۆن وەڵامت دایەوە؟» گوتی: «من لە ناویاندا بووم، بەڵام لەوان نەبووم. کاتێ بەڵا هات، منیش تووش بووم؛ ئێستاش لە لێواری دۆژەهم، نازانم رزگار دەبم یان دەکەومە نێو

دۆژەهەوە». عیسا گوتی: «ئەی یارانم! نانی جۆو خوێی زبرو بەرگی پەلاس و نووستن لە کەلاوە، رەنگە ببێتە هۆی رزگاری لە دونیا و بەختەوەری لە دوارِۆژ». هەروەها گوتی: «ئەی ئەو کەسانەی کە بۆ مز و کرێ پەرای دونیا دەکەن، گەر واز لە دونیا بێنن، کرێی زۆرترتان پێ دەدری».

سلەیمان کورِی داوود لەگەڵ دەست وپێوەندکانی دەرِۆیشت و مەل و مۆر و دێو و پەری پەرایان دەکرد. لە رێدا عابدێکی بەنی ئیسرائیلی بینی، گوتی: «ئەی کورِی داوود! پەروەردگاری مەزن ماڵ وسامان و دەسەلاتێکی زۆری پێ داوی». گوتی:«زیکرو یادێکی پەروەردگار لە نێو نامیلکەی کردەوەکانی بروادار، چاترە لە هەرچی دراوە بە کورِی داوود؛ چونکە ئەو زیکرە دەمێنی وئەم دەسەلاتە دەروا».

لە خەبەردا هاتووە کە: « کاتی ئادەم گەنمی خوارد، کاری ئاودەستی بۆ هاتە پێش: لە بەهەشتدا بۆ شوێنێ دەگەرِا کە خۆی تێیدا خالی کاتەوە. پەروەردگار فریشتەیەکی بۆی نارد و گوتی: "بۆچی دەگەرِێی؟" گوتی: "ئەوەی کە لە زکمدایە دەمەوێ لە شوێنێکدا دای بنێم." لە هیچ خواردنێکی بەهەشتدا ئەم تلفە نەبوو، بێجگە لە گەنم. گوتی: «لە کوێ دەتەوێ دایبنی: لە سەرعەرشی دادەکەی یان لە سەر کورسی، یان لە نێو رووبارەکانی بەهەشت، یا لە ژێر دارەکان؟ دابەزە بۆ نێو دونیا کە جێگای ئەم پیسایانەیە"».

لە خەبەردا هاتووە کە جوبرەئیل بە نووحی گوت: «بەم تەمەنەدرێژەت، دونیات چۆن بینی؟» گوتی: «وەکوو خانوویەکی دوو دەرگا: لە یەکێکیانەوە دەرِۆیتە ژوور، لە یەکێکیان دیتە دەر».

بە عیسایان گوت:«شتێکمان پێ فێرکە تا بەو شتە خودا خۆشمانی بوێ». گوتی:«دونیا بە دوژمن بزانن تا خودا بە دۆستتان بزانێ».

ئەم رادە لە ئەخبار کە گێرِدرایەوە بەستە و با برِۆینە سەروەختی ناسار.

**ئاسار**- عەلی کورِی ئەبیتالیب دەڵێ: «هەرکەس شەش کاری بەجێهێنا، بۆگەیشتن بە بەهەشت و دوورگرتن لە جەهەننەم هیچ کاری نەهێشتۆتەوە: هەرکەس خودای ناسی و خزمەتی کرد؛ شەیتانی ناسی ودژایەتی کرد؛ زانی راستەقینە کامە و لایدا بە لایەوە؛ هێڵی لاری ناسی و خۆی لێ پاراست؛ دونیای ناسی و فرِێی داو پەسلانی ناسی و کەوتە دووی».

هۆزانێک دەڵێ: «هەرچی لە دونیا پێت دەدرێ، پێشتر هی کەسێک بووە و پاش تۆش هی کەسیترە، بۆچی دڵی پێ دەبەستی؟ بەشی تۆ لە دونیا لە چاشتێک وشیوێک چیدی نییە؛ بۆ ئەم نەختە خۆت مەفەوتێنە و لە دونیادا رۆژوو بگرە و لە پەسلاندا بیکەرەوە؛ سەرمایەی دونیا ئارەزووی نەفسە و قازانجەکەشی هاوییەیە».

یەکێک لە ئەبووحازمی پرسی: «گەلێک دونیام خۆش دەوێ، چ بکەم ئەم خۆشەویستیەم لە دڵ نەمێنێ». گوتی: «هەرچی دەسکەوتت هەیە لە دونیا، با لە حەلاڵ بێ و لە جێگای ڕەوای خۆیدا خەرجی کە با ئەو خۆشەویستیە زیانت پێنەگەینێ». بەم بۆنەوە وای پێگوتووە چونکە زانیویە گەر وا بکا، دونیا لە بەر چاو دەکەوێ ودڵی لێ دەڕەوێتەوە.

یەحیا کوڕی مەعاز دەڵێ :«دونیا دووکانی شەیتانە، هیچی لێ مەدزە وهیچ هەڵمەگرە، چونکە ئەوکات تێتدەئاڵێ». فوزەیل دەڵێ: «گەر دونیا زێڕ بایە و بێدەوام، دواڕۆژ گڵێنە بایە و بەردەوام، مرۆڤی ژیر لەسەری بوو کە گڵێنە هەڵبگرێ و واز لە زێڕ بێنێ. دەسا چۆن گڵێنەی بێدەوام هەڵدەگرێ و زێڕی بادەوام فڕێ دەدا؟» ئەبووحازم دەڵێ: «خۆتان لە دونیا بپارێزن. بیستوومە هەرکەس دونیا بە گەورە دابنێ لە پەسلاندا دەیهێنن و بە سەریدا هاوار دەکەن کە: ئەمەیە ئەوکەسەی وا شتێک کە پەروەردگار بە بچووکی زانیوە، ئەو بە گەورەی داناوە"».

ئیبنی مەسعوود دەڵێ:«هەرکەس دێتە دونیا، میوانە و ئەوەی کە هەیەتی ئەمانەتە. ئاکامی ڕۆیینە و ئەنجامی ئەمانەتەش گێڕانەوەیە». لوقمان بە کوڕەکەی گوت: «کوڕم! دونیا بە پەسلان بفرۆشە، تا لە هەر دوویا قازانج کەی، پەسلان بە دونیا مەفروشە تا لە هەر دوویان زیان نەکەی».

ئەبوو ئیمامەی باهلی دەڵێ: «کە پێغەمبەر بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا، سوپای شەیتان پێیان گوت کە ئاوەها پێغەمبەرێک نێردراوە، دەڵێی چ بکەین؟ گوتی: دونیایان خۆش دەوێ؟ گوتیان: ئەرێ. گوتی: دەسا گەر دونیایان خۆش دەوێ خەم مەخۆن، هەرچەند بت ناپەرستن، بەڵام بە خۆشەویستی دونیا وایان لێ دەکەم کە هەرچی بە دەس دێنن لە ناڕەوا بێ و هەرچی خەرج دەکەن، بۆ ناڕەوا بێ و هەرچی کۆوە دەکەن لە ناڕەوا کۆوی کەنەوە؛ هەموو شەڕێک لەم سێ کارەوە هەڵدەستێ». فوزەیلی عەیاز دەڵێ: «گەر سەرلەبەری دونیا بە حەلاڵی پێم بدەن، ئەوەندە بێزم لێ دێ وەکوو چۆن ئێوە بێزتان لە مردار دێ». ئەبوو عوبەیدی جەڕاح سەرۆکی شام بو. کاتێ عومەر گەیشتە لای، هیچ شتێکی لە خانوویدا نەدی، بێجگە لە شیرێک وقەڵخانێک وقورئانێک و کۆپانی حوشترێ. گوتی: «بۆچی کەل و پەلت بۆ خانووەکەت دابین نەکردووە؟» گوتی: «ئەو شوێنەی کە بڕیارە بڕوین، هەر ئەم رادەیەی بۆ بەستە»؛ واتە: قەبر. حەسەنی بەسری نامەیەکی بۆ عومەری عەبدولعەزیز نوسی و لە نامەکەیدا تەنیا ئەمەی نووسی کە: «وابیر کەوە کە ئەو ڕۆژە هاتووە کە بڕیار بوو دوامین کەس بمرێ و مرد». لە پەرسڤیدا نووسیەوە کە: «بیر لەو ڕۆژە کەرەوە کە پێت وایە دونیا هەر نەبووە و هەر دواڕۆژ بووە». لە ئەسەردا هاتووە کە چەن سەیرە کەسێک دڵنیا بێ لە مردن وشاد بێ، سەیرتر ئەوەیە کە دڵنیا بێ لە دۆژەهـ وکەچی پێبکەنێ! زۆر سەیرتر ئەوەی کە دڵنیایە دونیا گفتی بۆ کەس تا سەر نییە و کەچی دڵی پێ دەبەستێ! ئەوەش زۆرسەیرە کە دڵنیایە لە ڕزق

و ڕۆژی، کەچی خەمی نانیەتی! داوودی تایی گوتی: «مرۆڤ پاشگەزبوونەوە و عیبادەتەکانی ئەمڕۆ بۆ سبەی دادەنێن، وەکوو بڵێی بێگاری دەکا یان قازانج بۆ کەسیتر داوا دەکا».

ئەبووحازم گوتی: «لە دونیادا هیچ شتێک نییە کە شادت کات و پاش ئەوە شتێک خەمبارت نەکا؛ وادیارە شادی پەتی نەخولقێندراوە». حەسەنی بەسری دەڵێ: «کەس لە دونیا ناڕوا بەبێ ئەوەی سێ سوێ پێسیری نەگرن: لەوەی کە کۆی کردەوە تێری نەخوارد، ئەوەی ئاواتی بوو و پێی نەگەیشت، ئەوەی کە دەیتوانی زادی دواڕۆژ کۆ کاتەوە و نەیکرد». محەمەد کوڕی مونکەدێر دەڵێ:«گەر کەسێک هەموو تەمەنی ڕۆژ بە ڕۆژوو بێ و شەو، شەوەنوێژ کا و فەرزی حەج و خەزا بەجێبێنێ و ڕۆژی پەسڵان پێی بڵێن" ئەمە ئەو کەسەیە کە دونیایەک کە خودا بە ناچیزەی زانیبوو، بەرز و بەڕێزی ڕاگرت"، دەبێ حاڵی چۆن بێ؟ دەسا دەبێ حاڵی دێمە چۆن بێ کە هەم دونیامان خۆش دەوێ و هەم عیبادەتمان ناتەواوە؟» دەڵێن: «دونیا خانوویەکی کاولە و کاولتر لە ئەو دڵێکە کە هەڵوەدایە بەدوویا، بەهەشت خانوویەکی ئاوەدانە وئاوەدانتر ئەو دڵەیە بۆی دەگەڕێ».

ئیبراهیمی ئەدهەم بە یەکێکی گوت:«درهەمێکت لە خەوندا پێ خۆشە یان دینارێک لە بێداریدا؟» گوتی: « دینارێک لە بێداریدا».گوتی: «درۆ دەکەی، دونیا خەونە و دواڕۆژ بێداری، کەچی تو دونیا و ئەوەی تێیدایە، خۆشترت دەوێ». یەحیای مەعاز دەڵێ: «ئەو کەسە ژیرە کە سێ کار بکات: دەست لە دونیا هەڵبگرێ، بەرلەوە دونیا دەستی لێ هەڵبگرێ؛ بەرلەوەی بڕواتە نێو گۆر ،ئاوەدانی کاتەوە؛ بەرلەوەی بگاتە خزمەتی پەروەردگار خۆشحاڵی بکا». دیسان گوتی: «بەدفەڕی دونیا ئەوەیە کە حەز پێکردنی لە خوات دوور دەکاتەوە، چ بگاتە کەوتنە دووی».

بەکر کوڕی عەبدوللا دەڵێ:«ئەوەی بیەوی بە دونیا دەرباز بێ، وەکوو ئەو کەسەیە کە بۆ کوژاندنەوەی ئاور هێزمی وشکی بەسەردا بخا». عەلی گوتی: «دونیا بریتیە لەم شەش شت بۆ خواردن، خواردنەوە، کردنە بەر، بۆن کردن، سواربوون و بەهاوسەریگرتن. هێژاترین خواردنەکان هەنگوینە و ئەویش ئاوی دەمی مێشێکە؛ هێژاترین بەرگ، ئاوریشمینە و ئەوەش کرمێک دەیچنێ؛ هێژاترین بۆن، میسکە وئەوەش خوێنی کارئاسکێکە؛ هێژاترین سواری، سواری ئەسپە و زۆربەی پیاوان لە سەر پشتی ئەو دەکوژرێن؛ خۆشترین ئارەزووەکان ئارەزووی ژنانە ئەوەش مێزدانیکە کە دەگاتە میزدانیتر؛ ژن جوانترین بەشی خۆی بۆت دەڕازێنێ، کەچی تۆ دزێوترین بەشی لێ داوا دەکەی». عومەری عەبدلعەزیز گوتی: «هۆ خەڵکینە! ئێوەیان بۆ کارێک خولقاند، گەر بڕواتان پێ نییە کافرن و گەریش هەتانە و بە ئاسانی دەگرن گێل و نەزانن؛ چونکە ئەنگۆیان بۆ ژیانی هەتاهەتایی ئافراندووە و تەنیا لە ژوورێکەوە دەڕۆنە ژوورێکیتر».

**شرۆڤەی راستەقینەی دونیای کرێت**

لە سەردێری ناسینی دونیادا بەشێکمان بۆ ئەم بابەتە تەرخان کرد، لێرەدا دەبێ ئەمە بزانین کە پێغەمبەر فەرمووی: «دونیا و هەرچی تێیدایە لەحنەتی خودای لێ کراوە، مەگین ئەوەی کە بۆ خودایە». کەواتە دەبێ بزانین ئەوە چییە کە بۆ خودایە و کرێت نییە، هەروەها کام شت کرێتە و بەسەرچاوەی گوناحان دێتە ئەژمار.

هەرچی لە دونیایە دەبێتە سێ بەش:

**یەکەم**- ئەوەیە کە هەم لە روالَت و هەمیش لە دەروون بۆ دونیایە و قەد بۆی بووز ناخوا کە هی دوارۆژ بێ. ئەوەش سەرجەمی گوناحانە کە هیچ بە مەبەستی رەزای خوداوە ناکرێن؛ هەروەها خۆ نوقمکردن لە چێژ و خۆشییە موباحەکانیش هەروایە؛ چونکە ئەوانەش تەنیا بۆ دونیان و دەبنە گەرای بێ ئاگایی و تووشهاتن بە گوناح و تاوان.

**بەشی دووم**- ئەوەیە کە لە روالەتدا بۆ خودایە، بەلام رەنگە بە مەبەست و نییەت بۆ دونیا بێ و ئەمەش خۆی دەبێتە سێ بەش: بیرکردنەوە و یادکردنەوە و دژایەتی لە گەڵ شاوەت. ئەم سێیە گەر بە بۆنەی دوارۆژ و پەروەردگارەوە بن، هەر چەند وان لە نێو دونیا، بەلام هی پەروەردگارن. گەر مەبەست لە بیر کردنەوە، کۆ کردنەوەی زانستە بۆ گەیشتن بە پلە و پاگەی دونیایی و مەبەست لە زیکرویادی خودا ئەوەیە کە خەلکی بە پیاوی خوای بزانن و مەبەست لە دووری لە شاوەتەکان ئەوەیە کە بە پارێزکار و پیاوچاکی بزانن، ئەمانە هی دونیان و زۆریش کرێت و سهێتن وکەوتوونەتە بەر لەحنەتی خودا، هەر چەند کە لە روالەتدا بۆخودان.

**بەشی سێهەم**- ئەوەیە کە هەرچەن لە روالەتدا وادیارە کە بۆ چێژی نەفسە، بەلام لە ناوەرۆکدا بۆ خودایە و هی دونیا نییە؛ وەکوو خۆراک خواردن کە بە مەبەستی هێزگرتن بۆ عیبادەت بێ، یان ژنهێنان کە بۆ مندال بێ، یاخۆ کارکردن کە بۆ ئەوە بێ بژیوی ژینی دابین کا و دەست بۆ خەلکوخوا رانەکێشێ.

پێغەمبەر گوتی:«هەرکەس دونیای بۆ خۆهەلکێشان بەسەر خەلکدا بوێ، خوا دەبینێ کە لێی توورەیە؛ بەلام گەر بۆ بێنیازی لە خەلکی بوێ، لە رۆژی پەسلاندا رووی وەکوو مانگی چاردە دەدرەوشێتەوە».کەواتە، دونیا ئەوەیە کە بۆ چێژو خۆشی نەفسە و هیچ کەلکێکی بۆ دوارۆژ نییە. هەروەها هەرچی پێویستی دوارۆژ بێ و بە مەبەستی دوارۆژ بکرێ، هی دونیا نییە؛ هەروەکوو چۆن ئالفی چوارپێیان لە رێی حەجدا لە ریزی زادی حەجە. هەرچی هی دونیا بێ، پەروەردگار پێی دەلێ

ئارەزووی نەفس». وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ . فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ[1]. لە شوێنێکی تردا هەمووی لە پێنج شتدا کۆوە کردووە وگوتوویە: أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ[2]؛ گوتی دونیا هەمووی پێنج شتە: یاری و رابواردن وئارەزووەکان وخۆخەملاندن و رکەبەری لە کۆوەکردنی ماڵ ومنداڵ. ئەو شتانەش کە ئەم پێنجەی تێدا کۆ کراوە بریتین لە: زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ[3]. دەڵێ ئەم حەوت شتە لە دڵی مرۆڤدا خەملێندراوە: ژن ومنداڵ و زێڕ و زیو و ئەسپ و زەوی و زار و وڵسات و ئاژەڵن. ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا[4]؛ ئەمە بەهرەمەندی خەڵکە لە دونیا.

بزانە، هەرچی لەم ریزە بێ و بۆ کاری دواڕۆژ بێ، هی دواڕۆژە؛ بێ گومان رابواردن و زۆرتر لە نیاز خواستن، بۆ دواڕۆژ نییە. بەڵکوو دونیا سێ رادەی هەیە: ئەوەی کە لێ ناچار بێ بریتییە لە خواردن و پۆشەن و خانوو، پاش ئەوە، ئەو شتەیە کە نیازە و پتر لەوەش رابواردنە کە دوایی بۆنییە[5]. هەرکەس بەو رادەی کە لێی ناچارە قنیاتی کرد، رزگار بوو، ئەوەش کە خەریکی رابواردن بوو تووشیاری هاویە بوو، ئەوەش بەقەدەر پێویستی قنیاتی کرد، لە مەترسی بە دوور نییە، چونکە لە نێوان هەر دوو رەهەندە: یەکێک ئەوەیە کە بە ناچاری نزیکەو یەکیش ئەوەی کە بە رابواردن نزیکە؛ لەم ناوەدا ئاستێک هەیە کە بە بۆچوون و کۆشەوە دەبینرێتەوە. رەنگە زیادەیەک کە پێویست نییە، بخاتە ریزی نیازەکانیەوە و تووشی مەترسی لێپرسینەوە بێ. لەم سۆنگەوە گەورەکان وپارێزکاران لە رادەی ناچاری تێنەپەڕاون. پێشەوا و گەورەی ئەم رێبازە، وەیسی قەرەنییە کە ئەوەندە خۆی لە دونیا دەپارست، هۆزەکەی پێیان وابو کە شێت بووە. جاری وابوو کە ساڵ بە ساڵ کەس نەیدەبینی. کاتی نوێژی بەیانی دەهاتە دەرو بۆ نوێژی خەوتن دەگەڕایەوە. خواردنی برتییە بوو لە ناوکەی خورما کە لە رێدا دەیچنییەوە. ئەگەر خورمایەکی خراپی دەست کەوتایە، دەیخوارد و ناوەکەکەی بە سەدەقە دەدا؛ گەر ئەوەی دەس نەکەوتایە، ناوکە خورمای دەفرۆشت و خوراکی دەکڕی. بەرگەکەی پەڕوەکۆنە بوو کە لە کەلاوەدا دەیبینیەوە ودەیشوشت و دەیکردە بەر. منداڵان بەردیان بۆ

---

[1] - ( قورئان،۷۹/٤۰و٤۱) ئەوەی نەفسی لە ئارەزووەکانی بپارێزێ، بەڕاستی کە بەهەشت جێگایە.

[2] - قورئان، ۵۷/۲۰.

[3] -قورئان، ۳/۱٤.

[4] - قورئان، ۳/۱٤.

[5] - سێ رادەکە بریتییە لە: ئەوەی کە پێی ناچاری، ئەوەی کە پێویستە وئەوەی کە بۆ رابواردنە.

دەهاویشت کە شێتە، ئەویش دەیگوت: «بەردی بچووکم بۆ فڕێ دەن با پێم نەشکێ و پەکی نوێژ و دەسنوێژم نەکەوێ». بەم بۆنەوە پێغەمبەر کە قەد نەیدیبوو، زۆر پەسنی دەکرد و بە عومەری راسپارد بوو کە بڕواتە لای. کاتێ عومەر خەڵکی عەراقی کۆوە کرد و لە سەر مینبەر گوتی: «هۆ خەڵکینە! هەرکەس خەڵکی عەراقە، هەستێ». هەموویان هەستان. گوتی:«هەرکەس قەرەنی نییە دانیشێ». بێجگە پیاوێک هەموو دانشتن. گوتی:«تۆ خەڵکی قەرەنی؟» گوتی:«بەڵێ». گوتی:«ئوەیسی قەرەنی دەناسی؟» گوتی:«دەیناسم، ئەو کابرا بچووکتر لەوەیە کە گەورەیەکی وەکوو تۆ هەواڵی بپرسێ؛ لە ناو ئێمەدا کەس لەو بێنرخترو سووکتر وشێتۆکەتر ونەدارتر نییە». عومەر کە ئەمەی بیست، دایە پرمەی گریان وگوتی: «بۆیە هەواڵی دەپرسم چونکە لە پێغەمبەری خودام بیست کە" بە ژمارەی رەبیعە و موزەر، خەڵک بە تکای ئەو دەڕۆنە نێو بەهەشتەوە"». رەبیعە و موزەر دوو هۆزی گەورە بوون کە ژمارەیان لە وتن نەدەهات.

هەرەمی حەییان گوتی:«کە ئەوەم لە عومەر بیست، بۆ دیتنەوەی وەیس رووم لە کووفە نا. لە کووفەدا هەواڵم پرسی تا چاوم پێیکەوت: لە لێواری فوراتدا خەریکی جلک شوشتن و دەستنوێژ گرتن بوو. لە دوورەوە ناسیم. سلاوم لێکرد، وەرامی دامەوە. سەیری کردم، ویستم دەستی بگرم، دەستی پێم نەدا. گوتم: "خودا بتبەخشی وبتبوورێ، ئەی ئووەیس، چۆنی؟" لە بەر خۆشەویستیەک کە کەوتە نێو دڵم، فرمێسکم لە چاوان بەربۆوە. زۆرم بەزەیی بەحاڵی نەزاریدا هاتەوە. ئەویش گریا وگوتی: "خودا بتژینێ ئەی هەرەمی کوڕی حەییان. چۆنی براڵە گیان؟ کێ رێنوێنی کردیتە لای من؟" گوتم: "تۆ کە قەد منت نەدیوە و نەناسیوە، چۆن ناوی خۆم و باوکم دەزانی؟" گوتی: "شارەزای شارەزایان پێی گوتم، رۆحی من، رۆحی تۆی ناسی، رۆحی بڕواداران هەرچەند یەکێان نەدیبێ، ئاشنای یەکن و یەکتر دەناسن". گوتم: "لە پێغەمبەر خەبەرێکم بۆ بگێڕەوە با بێتە دیاریم". گوتی: "لەش و گیانم بە فیدای پێغەمبەر بێ! من ئەوم نەدی وخەبەرەکانیم لە خەڵکوخوا ژنەفتووە و نامەوێ رێگای گێڕانەوەی حەدیس بۆ خۆم ئاوەڵا کەم و نامەوێ ببمە حەدیسوان و موفتی و رێنما". گوتم: "ئایەتێکی قورئانم بۆ بخوێنەوە با لە تۆی ببیسم، دوعایەکم بۆ بکە و ئامۆژگارییەکم بکە تا بە کاری ببەم؛ چونکە تۆم لە بەر پەروەرگار خۆش دەوێ". دەستی گرتم و بردمیە لێواری فورات و گوتی: "أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم". دەستی کرد بە گریان. پاشان گوتی: "ئاوەها دەڵێ پەروەرندم راستترین پەیڤ هەر پەیڤی ئەوە: وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ[1]. پاشان دەڵێ: وَمَا خَلَقْنَا

---

١ -( قورئان، ٥١/٥٦ ) تۆ هەر وە بیریان بخەوە، بیرەوەمیی بەهرە دەدا بەوانەی خاوەن باوەڕن. (هـ)

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ.مَا خَلَقۡنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ[1]؛ تا دەگاتە إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ[2]". پاشان هاوارێکی کرد کە پێم وابوو بووراپەوە، پاشان گوتی: "ئەی کوڕی حەییان! بابت مرد و زۆری نەماوە تۆش بمری و یان بڕوێتە بەهەشت یان دۆزەخ. باوکت ئادەم مرد و دایکت حەووا مرد و نوح مرد و ئیبراهیم -خەلیلیخوا- مرد و مووسا -کەلیمیخوا- مرد و داوود مرد و محەحەدی خۆشەویست -پێغەمبەری خودا مرد- دوورودی خوایان لە سەربێ- ئەبووبەکر مردو عومەری برام مرد". گوتم: "خوابتبەخشێ! عومەر نەمردووە". گوتی: "پەروەرندەم لە مردنی عومەر ئاگەداری کردمەوە". کە ئەمەی گوت، گوتی: "من و تۆش لە ریزی مردووانین". سەڵەواتی نارد بۆ پێغەمبەر و دوعایەکی بە خێری بۆ کردم و گوتی: "ڤەونیتی من بۆت ئەوەیە کە رێگای کتێبی خودا و پیاوچاکان بگرەبەر وتەنیا تاوێک لە یادی مردن بەدوور مەبە، کە گەیشتیتە هۆزەکەت لە پەندو ئامۆژگاریت درێخیان لێ مەکە و هەنگاوێک لە هاوڕایی سوننەت و جەماعەتی ئومەت رامەمێنە، چونکە رەنگە بێدین کەوی و لەو سۆنگەوە تووشیاری دۆزەخ بی". چەن دوعایەکی کرد وگوتی:"ئەی هەرەم!کە رۆیشتی، نەتۆ من دەبینی نە من تۆ دەبینم؛ بە دوعای خێر یادم بکە. منیش یادی تۆ دەکەم. تۆ لەم لاوە برۆ با منیش لەم لاوە برۆم". ویستم چەن هەنگاوێکی لە گەڵدا برۆم، نەیهێڵا وگریا و منیش گریام. پاش رۆیشتنی ئەوەندە سەیرم کرد تا لە نێو کۆڵانەکانی کووفەدا لەبەرچاوم بزر بوو و پاش ئەوە ئیتر هیچ هەواڵێکم لێ نەبوو».

کەواتە، ئەوانەی دونیایان بە چاکی ناسی، رەوشتیان هەر ئاوەها بوو؛ رێگای پێغەمبەران و یارانی خوداش هەروایە. ئەگەر نەتوانی بگەیتە ئەم ئاستە، لانی کەم دەتوانی لەوەی پێویست و نیازە لا نەدەی و بە تەواوی رێگای رابواردن نەگریتە بەر، تا تووشی مەترسییەکی مەزن نەبی.

ئەمەی بێژرا بۆ باسی دونیا بەستە و ئەوەی پێویست بێ لە سەردێڕی موسوڵمانیدا بێژراوە.

---

[1] - (قورئان، ٤٤/٣٨ و٣٩ ). ئێمە ئەم ئاسمانانەو زەمینە و هەرچی لە ناو ئەو دوانەدا، بۆ گەمەمان ساز نەداوە؛ هەر بۆ راستی هەموومان وەدی هێناون؛ بەلام زۆربەیان نازانن. (هـ)

[2] - (قورئان، ٤٤/٤٢ ) کە هەر خۆی بە دەسەلات و دلۆڤانە. (هـ)

## بنەمای شەشەم- دەرمانی رژدی وچاوچنۆکی بۆ کۆوە کردنی ماڵ وسامان

بزانە، لق‌وپۆی دونیا گەلێک زۆرە و یەکێکیان ماڵ‌وسامانە و یەکیان پلە و پاگەیە و هەروەها لق و پۆی‌تریش هەیە. بەلام بشێونەی ماڵ گەلێک زۆرترە. گەورەترەن ئاژاوەیەک کە خودا پێی گوتی عەقەبەیە و گوتی: فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ . وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ . فَكُّ رَقَبَةٍ . أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ[1]. هیچ ملەیەک هەلەتتر لەمە نییە، چونکە دەربازبوونی بۆ نییە. ماڵ‌وسامان هەرچەن بۆ دابین‌کردنی ئارەزووەکانی نەفسە، بەلام توێشووی رێگای پەسلانیشە؛ چونکە مرۆڤ لە خۆراک وجلک و خانوو ناچارە و ئەمەش هەمان سامانە و بە سامان دێتە دەست. کەواتە، کەس ناتوانێ بۆی نەگەڕێ و هەرکەسەش بۆی بگەڕێ، تووشی مەترسی دێ. گەر نەبێ، هەژاری دێ و لە سۆنگەی هەژاریوە رەنگە مرۆڤ تووشی کوفر بێ، گەریش بێ، مرۆڤ دەولەمەند دەبێ و ترسی ئەمەش زۆرترە. هەژاری دوو دۆخی هەیە: یەکەم چاونەزێری و دووەم چاوتێری.چاوتێری چاکە. چاونەزێری دوو دۆخی هەیە: یەکیان چاو لە سامانی خەلکی برین، دووەم بە دەستی خۆ سامان کۆوەکردن. کۆوەکردنی سامان بە دەستی خۆ، چاکە و پەسن کراوە. دەولەمەندیش دوو دۆخی هەیە: یەکەم رژدی ودەسقووچاوی، دووەم دلاوایی و دەهندەیی. دەهندەش دوو دۆخی هەیە: یەکەم زێدەڕۆیی و دووەم ئەنازە راگرتن. لەم دۆخانەی کە بێژران، یەکێکیان خراپ و کرێتە و لەویتر ئالاوە و ناسینی ئەمانەش گرینگ و پێویستە. بەگشتی، ماڵ وسامان لە قازانج و زیان بەدوور نییە و دەبێ هەردوویان بناسی تا لە زیانەکانی بە دوور بی و بەقەدەر نیازت پەیدوزی بی.

## شرۆڤە کرێت بوونی خۆشویستنی ماڵ وسامان

پەروەردگاری مەزن دەلێ:يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن

---

١ - (قورئان، ٩٠/١١ – ١٤ ) وەلێکان نەو خۆی لە رێگەِ هەلمت نەدا؟ کوو دەزانی مەبەس لەرێی هەلمت چیە؟ ئازادکردنی کویلەیـە. یان نان‌دانە، لە رۆژی قاتی‌وقڕیدا. (هـ)

یَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ[1]؛ واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! هەرکەس بە بۆنەی ماڵ ومناڵیەوە لە یادی خودا خافڵ بێ، لە ریزی زیانکارانە.

پێغەمبەر گوتی:«خۆش‌ویستی ماڵ‌وسامان، وا دوڕازی لە دڵ دەڕوێنێ کە ئاو کەوەرگ دەڕوێنێ». دیسان گوتی: «دوو گورگی برسی کە لە نێو شەگەلێکدا بەربن، ئەوەندە زیان نادەن کە خۆش-ویستنی ماڵ زیان لە دینی بڕوادار دەدا». پرسیاریان کرد: «ئەی پێغەمبەری خودا! چاکترینی ئوممەتت کێن؟» گوتی: «دەوڵمندان». پاشان گوتی: «پاش من تاقمێ دێن کە خۆراکی خۆش و جۆربەجۆر دەخۆن و بەرگی ئاڵ‌ووالا دەبەر دەکەن و ژنی بەدەو دێنن وئەسپی رەسەن سوار دەبن، ورگیان بە کەم تێرنابێ و بە زۆریش پڕ نابێ، هەموو کۆشەوەیان بۆ دونیایە ودونیایان کردۆتە خودانی خۆ و هەرچی دەکەن بۆ ئەوی دەکەن. من کە محەممەدم، پێتان رادەسپێرم کە هەرکەس لە منداڵی منداڵتان کە پێیان گەیشت، سڵاوی ئەم تاقمە نەکا و لە نەخۆشیدا لێیان نەپرسێ ولە ئەسپەردەیاندا بەشداری نەکا و رێز بۆ گەورەکانیان دانەنێ. هەرکەس کردی، لە فەوتاندن و وێران‌کردنی موسڵمانیدا بۆتە یاوەریان».

پێغەمبەر فەرمووی:«دونیا بۆ یارانی بەجێ بێڵن، چونکە هەرکەس پتر لە نیازی شتێکی لێ ئەستاند، ئەوە هۆی نەمان و فەوتانیە وخۆیشی نازانێ». دیسان دەڵێ:«مرۆڤ دەڵێن: ماڵی من و سامانی من. کەچی هیچ شت هی ئێوە نییە مەگین ئەوەی دەیخۆن و دەیفەوتێنن، دەیکەنە بەر و کۆنەی دەکەن، یان بە سەدەقەی دەدەن و بۆ هەتاهەتای خۆتانی پاشەناز دەکەن». یەکێک لە پێغەمبەری پرسی: «بۆچی بۆ مردن تەیار نیم؟» گوتی: «ساماندار ی؟» گوتی: «بەڵێ». گوتی: «بەر لە خۆت بەرێی‌کە»؛ واتە: بە سەدەقە بیدە بە خەڵکی، چونکە دڵی مرۆڤ لە گەڵ سامانیە، کە بیهێڵێتەوە، پێی خۆشە بمێنێتەوە، کە بینێرێ، پێی خۆشە بڕوا. فەرمووی دۆستانی مرۆڤ سێ دەستەن: «یەکیان تا بە کاتی مردن بە ئەمەگە لە گەڵی، یەکێک تا لێواری قەبر لە گەڵیایە ویەکێک هاوڕێ و هاودەمیە تا رۆژی پەسڵان. ئەوەی تا کاتی مردن بە ئەمەگە، ماڵ وسامانە، ئەوەی تا لێواری گۆڕ دێ، زاروزێچ وکەس وکارە و ئەوەی تا پەسڵان هەر هاوڕێیە، کردەوەکانن». هەروەها گوتی: «کەمرۆڤ دەمرێ، خەڵکی دەڵێن: "چی بە جێ هێشتووە؟" بەڵام فریشتەکان دەڵێن: "چی ناردووە؟"» هەروەها فەرمووی: «ماڵ وسامان پێکەوە مەنێن، چونکە ئەو کاتە دڵبەستەی دونیا دەبن».

حەوارییەکان بە عیسایان گوت: «بۆچی تۆ دەتوانی بەسەر ئاودا بڕۆی و ئێمە ناتوانین؟» گوتی:

---

[1] قورئان، ٩/٦٣.

«بایەخی زێڕ و زیو لە لاتان چۆنە؟» گوتیان: «باشە». گوتی: «لە لای من لە گەڵ خاک یەکسانە».

**ئاسار**- یەکێک ئەبوودەردای رەنجاند، گوتی:«خوایا! تەندورستی و دەوڵەمەندی و تەمەن درێژی پێ خەلات کە!» ئەم دوعایەی بە خراپترین دوعا زانی، چونکە هەرکەس ئەمانەی بێ تووشیاری بێ ئاگایی لە دوارۆژ دێ وچارەڕەش دەبێ.

عەلی دەرهەمێکی لە نێو لەپی دانا وگوتی: «تۆ هەر ئەوەی تا لە دەستم نەڕوێتەدەر کەلکت بۆم نییە». حەسەنی بەسری دەڵێ: «سوێند بە خوا کەس زێڕ وزیوی بەڕێز نەگرت کە خودا بە سووکی نەگرێ». لە ئاساردا هاتووە کە یەکەم جارێک کە زێڕیان لێدا، بردیانە لای ئیبلیس؛ هەڵیگرت ونایە سەر چاوی و ماچی کرد و گوتی: «بەراستی کە هەرکەس تۆی خۆش بوێ، بەندەی خۆمە». یەحیایمەعاز دەڵێ: «درهەم ودینار دووپشکن، تا ئەفسوونەکەی نەزانی دەستی بۆ رامەکێشە، ئەگینا ژارەکەی دەتکوژێ». گوتیان: «ئەفسوونی کامەیە؟» گوتی: «ئەوەی کە لە حەلاڵ بە دەست بێنی و لە جێی خویدا خەرجی کەی». مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلێک لە سەرەمەرگی عومەریعەبدولعەزیزدا رۆیشتە لای، گوتی: «ئەی سەرۆکی بڕواداران! کارێک تۆ کردت کەس نەیکرد. سێزدە کوڕت هەیە و درهەمێکت بۆ بەجێنەهێشتن». گوتی:«هەڵمسێنن». هەڵیانسەند. گوتی: «هیچی ئەمانم بە کەس نەدا و هیچی کەسم بەمان نەدا. منداڵانم یا لەبار و گونجاون یا نالەبارو نەگونجاو. ئەوەی شیاو و گوێڕایەڵی خودایە، خودای بۆ بەستە، وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّـٰلِحِينَ[1]، ئەوەش نەگونجاو و نالەبار بێ، هەرچی بەسەر بێ خەمێکم نییە».

محەمەد کوڕی کەعبیقورەزی سامانێکی زۆری دەستکەوت. گوتیان: «بۆمنداڵانت بەجێی بێڵا». گوتی: «نە، ئەمە لە لای پەروەردگارم بۆ خۆم دادەنێم و پەرووەردگاریش بۆ منداڵانم، تا جوان و رێک وپێک بەخێویان کا». یەحیای کوڕی مەعاز گوتی: «خاوەن سامان لە سەرەمەرگدا دوو بەڵای هەیە کە کەسیتری بۆی نییە: ئەوەی کە هەموو سامانی لێ دەسێننەوە و لە هەمووشی دەپرسنەوە».

**سەرنج**: رەهەندی بەخێرو بێربوونی ماڵ وسامان: بزانە کە هەر چەند سامان لە هەندێ لایەنەوە ناحەزو دزێوە، لە هەندێ رەهەندەوە پڕخێروبێرە؛ چونکە هەم شەڕی تێدایە و هەمیش خێر. پەروەردگار لە قورئاندا بە خێر ناوی بردووە و فەرموویە: إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ

[1] - (قورئان، ٧/١٩٦ ) هەی بۆ خۆشی سەرپەرستی چاکان دەکا. (هـ)

بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ[1]. پێغەمبەر فەرمووی: «سامانی شیاو بۆ پیاوی شیاو پڕخێرو بێرە». دیسان فەرمووی: «كادَ الْفَقْرُ اَنْ یَكوُنَ كُفْراً»؛ مەترسی ئەوە هەیە کە هەژاری بە کوفر بگات. هۆکەی ئەوەیە کاتێ خۆی بۆ پارووە نانێ کە بۆ تێرکردنی سکی خۆی و ژن و مندالی پێویستە، داماو و بێنەنوا دەبینێ و کەچی دونیا تەژی لە نیعمەتی جۆراوجۆر و ئال و والایە، شەیتان پێ دەلێ: «ئەمە چ دادو ئینسافێکە کە لە پەروەردگاری دەبینی؟ ئەمە چ دابەشکردنێکی نەگونجاو و نالەبارە کە ئەوەندەی بە ستەمکار وخراپکار داوە کە نازانن چی لێ بکەن، کەچی لەم لاوە هەژارێکی وەکوو تۆ لە برسان دەکوژێ و دەرهەمێکی پێ نادا. گەر نازانێ کە بێچارەی، ئەوە لە زانستیدا کەمایەسی هەیە، گەر دەزانێ و ناتوانێ، لە دەسەلاتیدا کەمایەسییە؛ گەر دەزانێ و دەتوانێ و نادا، لە بەزەیی و دلۆڤانیدا کەموکووڕی هەیە؛ گەر بۆ ئەوە نادات تا لە دوارۆژدا پاداشت پێ بدا، خۆ بەبێ‌ڕەنج و برسیەتیش دەتوانێ پاداش بدات، بۆچی نایدا، گەریش ناتوانێ، دەسەلاتی ناتەواوە. لەگەل ئەمانەی کە بێژران، باوڕکردن بەمەی کە پەروەردگار دلۆڤان و دلاوا و دەهندەیە و کەچی نووکەوبەدی عالەم تووشی ڕەنجوئازار دەکا و لەولاوە خەزانەکانی پڕ لە نیعمەتن و بۆ خۆی نایدا، گەلێک ئەستەمە». شەیتان ئەوە بە ڕێگای وازوازی دەزانێ؛ پرسی قەدەر-کە ڕاستەقینەی لە هەمووکەس بەرپیوارە- لە پێشی رادەنێ، تا بەلکوو تووڕەی کاو زەوی و زەمان بداتە بەر جنێو و بلێ: «ئاسمان نەزان بووە و ڕۆژگار سەرنخون بووە و نیعمەتەکانی دەداتە کەسێک کە نیازیان پێ نییە و ناڕەواو نالەبارن». گەر پێی بلێن: «ئاسمان و ڕۆژگار لە ژێر ڕکێفی دەسەلاتی پەروەردگاردان» و بلێ: «نییە» ئەوە کافر بووە و گەریش بلێ«هەیە» ئەوە ناسزای بە خودا گوتووە وئەمەش هەر کوفرە. بەم بۆنەوە پێغەمبەر گوتی:«لاَ تَسُبواَالدَّهرَ فَاِنَّ اللهَ وهُوَ الدَّرُ؟» واتە: جنێو بە عالەم مەدەن، کە عالەم پەروەردگارە. واتە ئەوەی بە هۆی کارەکانی دەزانن وپێی دەلێن عالەم، ئەوە پەروەردگارە.

کەواتە، بۆنی کوفر لە هەژاریوە دێ، بێجگە کەسانێک کە بڕوایان ئەوەندە پتەوە کە ڕازی بن بەهەژارییەک کە پەروەردگار بۆی ڕەچاو کردوون و دەزانن کە خێریان لەوەدایە کە بە هەژاری بژین. چونکە زۆربەی خەلکی بەم چەشنە نین، چاتر وایە لانی کەم بە قەدەر نیازیان هەیانبێ. بەم بۆنەوە بوونی مال پڕلەخێروبێرە.

ڕەهەندێکی‌تر ئەوەیە کە هەروەک ئاشکرایە، مەبەستی سەرجەمی زانایان، بەختەوەری دوارۆژە، گەیشتن بەو بەختەوەرییەش بۆ کەس نالوێ، مەگەر بە سێ نیعمەت: یەکێک لە نەفسدایە، وەکوو

---

[1] - (قورئان، ( ٢/١٨٠ مالێکی لەپاش دەمێنێ، بە تەرزێکی خوداپەسند وەسیەت بکا کە باب و دایک و خزمانی، هەرکەێ بەشی خۆی پێ بگا. پارێزگاران پێویستە ئەم کارە بکەن. (هـ)

زانست وئاکاری جوان، یەکێک لە لەشدایە و ئەوەش تەندروستیە و یەکێکیش لە دەرەوەی لەش و نەفسە و ئەوەش بەقەدەر نیاز بەهرەمەندییە لە سامانی دونیا. بێ نرخترینیان ئەوەیە کە لە دەرەوەی لەشدایە؛ واتە هەمان ماڵوسامان. بێنرخترین سامان، زێڕو زیوە کە هیچ قازانجێکیان نییە. بەڵام زێڕوزیو بۆ نان و بەرگن و نان و بەرگیش بۆ لەشە و لەشیش کۆڵبەری هەستەکانە و هەستەکانیش داوی ئاوەزن، ئاوەز چراو رووناکیدەری دڵە تا رێگای بینایی چاوان ببینێتەوە و بیناسێ. ناسینی پەروەردگاریش تووی بەختەوەرییە. کەواتە، دمایین مەبەستی هەموو شت پەروردگارە: سەرەتا ئەوە و دەرەنجام ئەوە و هەموو رێگایەکیش بۆ لای ئەوە. ئەوەی لەم راستییە گەیشت، لە سامانی دونیا هەر ئەوەندە هەڵدەگرێ کە نیازی پێیە و پتر لەوە بە ژاری کوشندە دەزانێ. ئەم سامانە شیاوە بۆ پیاوی شیاو. بەم بۆنەوە پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم! بژیوی بنەماڵەی محەممەد بە قەدەر نیازیان بدە». چونکە چاکی دەزانی هەرچی زۆرتر لەوە بێ، کوشندەیە و هەرچی کەمتر لە نیاز بێ، لە کوفر نزیک دەبێتەوە و ئەمەش هەر هۆی نەمان و فەوتانە.

کەوابوو، هەرکەس ئەمەی زانی، قەد سامان و ماڵی خۆش ناوێ؛ هەرکەس هەر شتێکی بۆ مەبەستیتر خۆش بوێ، ئەو مەبەستەی خۆش دەوێ نەک ئەو شتە؛ کەواتە هەرکەس ماڵی بە بۆنەی خودی ماڵەوە خۆش بوێ، سەرنخوون و نگوونسارە و راستەقینەی ماڵوسامانی نەناسیوە. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «تَعِسَ عَبدُ الدّینارِ وَ تَعِسَ عَبدُ الدِّرهَمِ»؛ واتە سەرنخوونە بەندەی دینارو سەرنگوونە بەندەی درهەم، چونکە هەرکەس لە بەندی شتێکدا بێ، ئەو شتە خوداوەندییە و هەرکەس پەرای شتێک بکا، ئەوشتە خودانیە. بەم بۆنەوە ئیبراهیم گوتی:وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ[1]؛ واتە: خۆم و زاروزیچم لە بتپەرستی بپارێزە. گەورەکان دەڵێن مەبەستی لە بت، زێڕوزیوە، چونکە ئەمانە بتی زۆربەی خەڵکن، کە روویان تێدەکەن؛ ئەگینا پلە و پاگەی پێغەمبەران بەرزتر لەوەیە بت بپەرستن.

## شرۆڤەی تێرو تەسەلی سوود و زیانەکانی ماڵ وسامان

بزانە سامان وەکوو مارە، هەم ژاری هەیە و هەمیش دەرمان، تا ژارو دەرمان لێک جیا نەکەیتەوە، راز و نهێنیەکەی ئاشکرا نابێ. کەواتە سوود و زیانەکانی یەک بەیەک و بە وردی راڤە دەکەین.

قازانجی ماڵ دەبێتە دوو بەش: دونیایی ودینی.

کەرتی یەکەم دونیایی: ئەمە پێویستی بە گوتن نییە وهەمووکەس دەیزانن.

---

١ - قورئان، ١٤/٣٥.

کەرتی دووەم دینییە: ئەمەش دەبێتە سێ جۆر:

**جۆری یەکەم** ئەوەیە کە بۆ عیبادەت یان دابین‌کردنی پێداویستی عیبادەت بۆ خۆتی خەرج کەی. عیبادەت وەکوو حەج وخەزایە. ماڵ وسامانێک کە بۆ خۆتی خەرج بکەی، هەمان عیبادەتە. ئەوەی بۆ دابین کردنی عیبادەت پێویستە، وەکوو خۆراک و جلوبەرگ بە قەدەر نیاز؛ چونکە بەوە، هێزی هەموو عیبادەتێک دابین دەبێ. هەر شتێک نەبوونی ببێتە هۆی پەک کەوتنی عیبادەت، بوونی ئەو شتەش خۆی عیبادەتە و هەرکەس بە قەدەر نیازی نەیبێ، ناچارە هەموو رۆژێ بە دڵ و بە لەش خەریکی بەدەستهێنانی گەرەکی ژین بێ و لە عیبادەت کە کاکڵەکەی زیکرو یادە، دوور دەبێتەوە. کەواتە چونکە رادەی پێویست بۆ عیبادەتە، ئەوکاتەی کە بۆ بەدەستهێنانی تەرخان دەکرێ، هەمان عیبادەتە و لە قازانجەکانی دینە و هی دونیا نییە. قیبلە و دۆزی دڵ، چەندوچوونی ماڵوسامان دیاری دەکا: گەر دۆزی دڵ گەیشتن بە ئاسوودەیی وئارخەیانییەک بێ بۆ کۆشەوە لە سەر رێگای دوارۆژ، رادەی پێویست، زادی رێگایە وبۆ خۆی بەشێک لە رێگایە.

شێخ ئەبولقاسمی گورگانی زەوی‌وزارێکی حەلالی بوو کە بە قەدەر نیازی بەرهەمی لێ هەڵدەگرت. خواجە بووعەلی فارمۆزی بۆی گێرامەوە کە رۆژێک دەخڵودانی ئەو زەوی و زارەیان هێنابوو، شێخ نەختێکی لێ هەلگرت وگوتی: ئەمە لە گەڵ پشت‌بەستنی هەموو پشت‌بەخودا بەسراوان ناگۆرمەوە». راستەقینەی ئەم قسەیە کەسێک دەزانێ کە خەریکی چاودێری بەسەر دڵیدا بێ و بزانێ کە چەندە گرینگە خەمی نانت لە کۆڵ کەوێ.

**جۆری دووەم**- ئەوەی کە دەیداتە خەڵکی و ئەمەش خۆی چوار بەشە:

**بەشی یەکەم**- سەدەقەیە. پاداشی سەدەقە و خێر و ودمی دوعا و نزا و هیمەت و رەزامەندی هەژاران لە دونیا و پەسلاندا گەلێک زۆرە. کەسێک ماڵ وسامانی نەبێ، لەم خێرو بێرە بێ‌بەشە.

**بەشی دووەم**- مێرخاسییە کە میوانداری برادەرانی دەکا- هەر چەند خۆیان دارابن- و چاکەیان لە گەڵ دەکاو دیارییان پێ دەدا و بۆ وەرگرتنی مافی خەڵکی رادەبێ و رەسم و یاسای جوامێری بەجی‌دێنێ. ئەم، هەرچەن لە گەڵ دەوڵەمەندان بێ، بەلام پەسنی کراوە و دلاوایی بەمە دەڵێن و دلاوایی یەکێک لە گەورەترین ئاکارەکانە و دواتر لە سەری باس دەکەین.

**بەشی سێیەم**- ئەوەیە کە ئابرووی خۆی پێی بپارێزێ، هەروەک ئەوەی کە پارە بدات بە شاعیر و پاسەوانان و ئەو کەسانەی تەمایان لیی هەیە و گەر هیچیان پێ نەدا زماندرێژی لە گەڵ دەکەن و بە خوسپە و جنێو ئابرووی دەبەن. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرچی بێتە هۆی ئەوەی ئابرووی خۆت لە تیزو توانجی خراپ‌بێژان بپارێزی سەدەقەیە، چونکە لەم سۆنگەوە رێگای جنێو و خوسپەیان دادەخرێ و ئافەتی دڵنگەران‌بوون بە قسەی خراپ‌بێژانی لە کۆڵ دەکەوێ؛ گەر وانەکا، رەنگە

ئەمیش هان بدا تۆڵەیان لێ بکاتەوە و دوژمنیەکی دوورو درێژی بۆ بێتە گۆڕێ. ئەمەش تەنیا بە ماڵ‌وسامان دەکرێ.

**بەشی چوارم**- ئەوەیە کە پارە بدات بەو کەسانەی کە خزمەتی پێدەکەن؛ چونکە هەرکەس کە خۆی هەموو کارەکانی خۆی بکا -وەکوو شۆردن وخاوێن کردنەوە و چێشت‌لێنان و کڕین و...- ژیانی بەم کارانەوە دەڕوا. فەرزی عەینی هەرکەس ئەوەیە کە بە کەسێکی‌تر جێبەجێ نەبێ و ئەوەش زیکرو یاد و بیرکردنەوەیە: هەرچی بە کەسێکی‌تر جێبەجێ بکرێ، خۆ پێوە خەریک‌کردنی، ژیان بەفیڕو دانە، چونکە تەمەن کورتە و مردن نزیکە و ڕێگای دواڕۆژ دوورو درێژە و توێشوو زۆرە؛ هەر هەناسەیەک هەلێکە بۆ گەیشتن بە بەختەوەری دواڕۆژ و نابێ بە کارێکەوە کە گرینگ نییە، بەفیڕۆ بدرێ. ئەمەش کە کەسێک کارەکانی بەکەسانی‌تر بسپێری بۆی جێبەجێ کەن، تەنیا بە ماڵ‌و سامان بۆی دەلوێ و بەس. گەر کەسێک خۆی کارو باری جێبەجێ کا، ئەوەش پاداشی هەیە، بەڵام ئەمە کاری کەسێکە کە عیبادەتی بە لەشە نەک دڵ؛ کەسێک کە عیبادەتی بە دڵ بێ و خەریکی زانست و بیرکردنەوە بێ، دەبێ کەسێکی‌تر کارەکانی بۆ جێبەجێ کا تا هەم ئەو خزمەتکارە پاداشی ئەو خزمەتەی بەرکەوێ و هەم ببێتە هۆی ئاسوودەگی ئەو کەسە تا بە خاترجەمی خەریکی عیبادەت بێ.

**جۆری سێیەم**- ئەوەیە کە پارە بە کەسێکی تایبەت نەدا، بەڵکوو شتێک چێ بکا کە هەموو خەڵکی بەهرەی لێ ببەن؛ وەکوو چێ‌کردنی پرد و مزگەوت و نەخۆشخانە و وەقف بۆ هەژاران. ئەم چاکانە گشتین و ڕۆژگارێکی دوور و درێژ دەمێننەوە و پاش مردنیش دوعا و نزای بەخێریان هەر بەردەوامە. ئەم کارەش تەنیا بە ماڵ وسامان دەکرێ. ئەمانەی بێژران، قازانج و خێری ماڵ‌و سامان بوون بۆ دین. هەروەها لە قازانجەکانی ماڵ‌و سامان دەتوانین ئاماژە بەمە بکەین کە دارا و دەوڵەمەند لە پێش چاوی هەمووان بەڕێز و هێژایە و لە خەڵک بێ نیازە و خەڵک پێویستیان پێیە و لەم سۆنگەوە دۆست و برادەری زۆر بە دەست دێنێ و لە لای هەمووان خۆشەویستە و بەسووکی سەیری ناکەن.

**ئافەتەکانی سامان**- هەندێ دونیایین و هەندێکیش دینی

ئافەتی دینی دەبێتە سێ جۆر:

**جۆری یەکەم** ئەوەیە کە ڕێگای گوناح و خراپەی بۆ ئاسان دەکا. ئارەزووەکانی نەفسی مرۆڤ بۆ خۆیان خوازیاری گوناحن، بەڵام کەم دەسی و نەداری، خۆی یەکێک لە هۆکانی بێ‌گوناحییە. گەر ئاوەها کەسێک بۆی لوا کە بپەرژێتە سەر کاری خراپ، تووشی گوناح دەبێ و خۆی دەفەوتێنێ و گەریش پشوودرێژ بێ، تووشی ڕەنج و ئازار دێ، چونکە پشوودرێژی لە کاتی دەسڕۆییندا گەلێک

دژوارە.

**جۆری دووەم،** ئەوەیەکە هەر چەن ئەو کەسە دیندار بێ و خۆی لە گوناح بپارێزێ، بەڵام لە چێژبردن لە شتی موباح، خۆی پێ ناگیرێ. کێ دەتوانێ دەوڵەمەند بێ و نانی جۆ بخوا و بەرگی پەڵاس لە بەر کا، وەکوو ئەوەی سلەیمان لەوڵاتی خوێدا دەیکرد؟ ئەم کەسە کە خەریکی رابواردن بوو، خووی پێدەگرێ؛ بە هۆی ئەو خووگرتنەوە، دونیا دەبێتە بەهەشت بۆی و مردن لەبەرچاوی کرێت دەبێ. هەروەها رەنگە هۆی رابواردن لە ماڵی حەڵاڵ هەموو کات بۆی دەست نەدا و ناچار لە شوبهە پارە دەربێنێ؛ یان ناچار بێ کە بە یاریدەی سوڵتان ماڵوسامان پێکەوە بنێ و بەم بۆنەوە تووشی زمانلووسێ و مەرایی و درۆ بێ. کە لە سوڵتان نزیک کەوتەوە، رەنگە بکەوێتە بەر نەفرەت و رقی سوڵتان؛ هەروەها رەنگە بکەوێتە بەر ئێرەیی کەسانیتر و دوژمنایەتی لەگەڵ بکەن و تەنانەت بیانەوێ کارەساتێکی بەسەردا بێنن و تووشی رەنج وئازاری کەن و ئەمیش بۆ تۆڵە ئەستاندن هەستێ و تووشیاری ململانێ و ئێرەیی بێ. چونکە لەم ئاکارەوە درۆ و خوسپە و خراپەویستن بۆ خەڵکی و گوناحەکانی دڵ و زمان دێنە دێ، دەبێتە سەرچاوە و بناوانی هەموو گوناحەکان. مەبەست لەمەی کە دەڵێن دونیا، سەرچاوەی هەموو گوناحەکانە، هەر ئەمەیە. ئەم گوناحانە هەموویان لق وپۆی ئەم خۆشەویستییەن. ئەمەش تەنیا یەک یان دە یان سەد ئافەت نییە، بەڵکوو ئافەتەکانی لە ژماردن نایەن. ئەوەش وەکوو هاویەی دۆژەهە، بێ سەر و بنە و دوایی بۆ نییە.

**جۆری سێیەم،** کەمتر کەسێک لەم یەکەیان دەربازبوونی بۆ هەیە؛ گەر کەسێکی دارا کە خۆی تووشی گوناح نەکا و خەریکی رابواردن نەبێ و لە شوبهە خۆی بپارێزێ و ئاگەدار بێ کە ماڵی حەڵاڵ بە دەست بێنێ و لە جێی خۆیدا خەرجی بکا و زۆر لەمەدا ورد بێتەوە و دڵی خەریکی چاوەدێری بەسەر دەخڵ و خەرجدا بێ و بەم بۆنەوە لە یاد و بیری پەروەردگار کە کاکڵەی هەموو عیبادەتێکە دوور بێتەوە و نەتوانێ بە تەواوی بە یادی خودا بێ و دڵ لە یادی هەرچی بێجگە ئەوە بگێڕێتەوە. خاوەن سامان گەر زەوی و زاری هەیە، بەردەوام لە بیری ئاوەدانکردنەوە و شەڕ و کێشەی جیرانان و دانی پیتاک و مزی وەرزێران و دابینکردنی بژیویانە، گەریش خەریکی بازرگانییە، سەری بە کێشەی ئامباز و کەل و پەلی سەفەر و دیتنەوەی مامەڵەیەکی پڕ قازانج قاڵە. گەریش خەریکی ئاژەڵداری بێ هەروایە. هەچ سامانێک وەکوو ئەوەی کە کەسێک گەنجێکی لە ژێرخاکدا بێ و بەقەدەر نیازی لێی دەربێنی و خەرجی کا، کەم کێشە نییە؛ کەچی بۆ ئەمەش دەبێ هەردەم ئاگەدار بێ کە لێی نەدزن، تەمای تێنەکەن و لە دەستی نەدا. ئەندێشە و بیری خەڵکی دونیا کەوشەن و تخووبی بۆ نییە. هەرکەس بیەوێ لەگەڵ دونیا بێ و بیری ئازاد بێ، وەکوو ئەو کەسەیە کە بیەوێ بدا لە ئاو و قولەپێی تەڕ نەبێ.

ئەمانە بوون ئافەت و قازانجەکانی ماڵوسامانی دونیا. بلیمەت و زانایان کە لەمەدا رامان، باش تێگەیشتن کە: گەر ماڵوسامان بەقەدەر نیاز بێ، دەرمانە و پتر لەوە ژارە. بەم بۆنەوە پێغەمبەر بە خێزانەکەی فەرموو: «هەرکەس پتر لە نیازی داوای کرد، فەوتاوە و نەیزانیوە».

بەلام بە گوێرەی شەرع، کرێتە کەسێک هەرچی سامانی هەیە بیفەوتێنێ و لە خۆی دابڕێ و دڵی سەرقاڵی نیازەکانی کا؛ هەروەک خودا فەرمووی: وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا[1].

## شرۆڤەی ئافەتی تەما و چنۆکی و قازانجی چاوتێری

بزانە، تەما وچاونەزێری لە ئاکارە خراپەکانن. بێجگە لە پەستی-کە لەو کاتەدا تووشی دێ- و شەرمەساری -کە لە دوارۆژدا تووشیاری دەبێ- گەر تەماکانی دابین نەبن، هەزاران ئاکاری خراپی لێ دەبێتەوە؛ هەرکەس تەمای لە کەسێکیتر کرد، شەرەقسە و مەرایی و دوڕازی لەگەڵی دەکا و بۆ رووبینی عیبادەت دەکا و پێداگری لە سەر سووکایەتی پێکردنی دەکا و لە خراپکاریدا یارمەتی دەدا. مرۆڤ، چاونەزێر ئافرێندراوە تا بەو شتەی کە هەیەتی قەد چاوی تێر نەبێ؛ بەبێ چاوتێری و قنیات کردن، قەد لە چاونەزێری رزگاری نابێ.

پێغەمبەر فەرمووی:«گەر مرۆڤ خێوی دوو سارای پڕ لە زێڕ بێ، داوای سێیەمینیش دەکا و بێجگە لە خاک چیتر چاوی تێر ناکا. هەرکەسەش لە گوناح پاشگەز بێتەوە، خودا دەیبوورێ». هەروەها گوتی: «هەموو شتێکی مرۆڤ دوایی دێ، بێجگە لە دوو شت: هیوا بە ژیان و خۆشەویستی ماڵوسامان». هەروەها گوتی: «خۆزگە بەوەی رێگای ئیسلامیان پێ نواند و بە قەدەر نیازی پێیان داو پێی قەناعەتی کرد». هەروەها فەرمووی: «گیانی پیرۆز[2] پێی گوتم: "هیچ بەندەیەک نامرێ تا ئەوەی کە رسق و رۆزییەکەی بە تەواوی پێی دەدرێ". بترسن لە پەروەردگار و بە ئەسپایی و بە هێمنی داوای رۆزی لێ بکەن»؛ واتە: داوای زۆر مەکەن و چاونەزێر مەبن. هەروەها فەرمووی: «خۆتان لە شوبهە بپارێزن تا پارێزکارترینی خەڵک بن، هەروەها بەوەی هەتانە قانیع بن تا شوکرانەبژێرترینی خەڵک بن و ئەوەی بۆ خۆتانی دەخوازن بۆ خەڵکیش هەر ئەوە بخوازن تا بڕوادار بن».

عووف کوڕی مالیکی ئەشجەعی دەڵێ: «حەوت یان هەشت کەس بووین؛ لە لای پێغەمبەر

---

١ - ( قورئان، ٢٩/١٧ ) دەستەکانت دەگەردنت وەر مەهێنە و تەواویش پانیان مەکەوە، کە بە سەرکۆنەکراوی و عەزرەتەوە دەمێنیەوە. (هـ)

٢ - روح القدس

دانشتبووین. گوتی: "لەگەڵ پێغەمبەری خودا بەیعەت ناکەن؟" گوتمان: " نە، پێشتر جارێک بەیعەتمان کردووە". دیسان فەرمووی: "بەیعەت ناکەن لەگەڵ پێغەمبەری خودا؟" دەستمان راکێشا و گوتمان: "لەسەرچی بەیعەت کەین؟" فەرمووی: " بەوەی کە هەر خودا بپەرستن و رۆژی پێنج فەرز نوێژ بکەن و هەرچی گوت، گوێی بۆ راگرن و بە قسەی بکەن"، پاشان بە ئەسپاییەوە گوتی: "لە هیچ کەس داوای هیچ مەکەن"». هەروەها گوتی: «ئەم کەسانە بە چەشنێ بوون کە گەر قەمچییەکیان لە دەست داکەوتایە، بە کەسیان نەدەگوت پێمانی بدەوە».

مووسا گوتی: «ئەی پەروەرێنەرم! کێ لە بەندکانت دەولەمەندترە؟» گوتی: «ئەو کەسەی کە بەو شتەی پێم داوە، چاوتێر بێ».

محەمەدی واسیع نانی وشکی بە ئاودا دەژەند ودەیخوارد و دەیگوت: «هەرکەس بەمە قنیات کا، لە هەموو خەڵکی بێ نیازە». ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «هەموو رۆژێ فریشتەیەک هاوار دەکا کە " ئەی کوڕی ئادەم! نەختێک لە دونیا کە پێداویستی ژیانت دابین کا، چاترە لە زۆرێک کە تووشیاری مەستی و پەستیت کا"».سومەیت کوڕی عجلان دەیگوت: «هەموو ورگت زۆرتر لە بستێک لە بستێکدا نابێ، بۆچی دەبێ بتباتە دۆزەخ».

لە خەبەردا هاتووە کە: «ئەی کوڕی ئادەم! گەر دونیاشت پێدەم، پتر لە خۆراکێک کە دەیخۆی بەهرەی لێ نابەی، دەسا گەر پتر لە خۆراکت پێت نەدەم و سەرقاڵی حسێب و کتێب بوون بخەمە ئەستۆی کەسانیتر، چ چاکەیەک لەوە مەزنتر کە لەگەڵ تۆم کردووە!»

هۆزانێ دەڵێ: «کەس بۆ رەنجکێشان پشوودرێژتر لە چاونەزێری تەماکار نییە و کەسیش کەیف خۆشتر لە قانیع نییە و کەسیش خەمبارتر لە ئێرەییبەر نییە و کەسیش لەش سووکتر لەوەی نییە کە وازی لە دونیا هێناوە و کەسیش وەکوو زانای خراپکار پەژیوان نییە».

شەعبی دەڵێ: «کابرایەک چۆلەکەیەکی گرت. چۆلەکە گوتی: چیت لێم دەوێ؟ گوتی: بتکوژم و بتخۆم. گوتی: خواردنی من هیچ کەلکێکی بۆت نییە. بەلام سێ ئامۆژگاریت دەکەم کە پتر لە خواردنی من قازانجی بۆت هەیە. یەکەمیان لە نێو مستی خۆتدا دەڵێم، دووەمیان کاتی فڕیمە سەر ئەو لقی دارە پێت دەڵێم و سێیەمینیان کاتێ گەیشتمە سەر ئەو یالە دەیڵێم. کابرا گوتی: باشە، بیڵێ. چۆلەکەکە گوتی: هەرچی لە دەستت چوو، بۆی پەرۆش مەبە و خەمی مەخۆ. بەرەڵای کرد. چۆلەکە فڕی و لە سەر لقی دارەکە نیشتەوە. کابرا گوتی: دووەمینیان بڵێ. گوتی: قەد باوەڕت بە قسەی نەشیاو ونەلواو نەبێ. فڕی و لە سەر یالێکدا نیشتەوە و گوتی: ئەی کلۆڵ! گەر منت بکوشتایە، لە نێو زگمدا دوو دانە مرواری بوو هەریەکەیان بیست مسقالە، دەولەمەند دەبوویەوە. کابرای دەستی خۆی گەست وگوتی: مخابن! ئیستا سێیەمینیان بڵێ. گوتی: تۆ ئەو دوانەکەت لە

بیر کرد، سێیەمینت بۆ چییە؟ گوتم خەمی رابردوو مەخۆ، گوتم بڕوات بە شتی نەلواو نەبێ. گوشت وپەڕوباڵی من سەرجەم دوو مسقاڵ نابێ، چۆن لە نێو زگمدا دوو مرواریدی بیست مسقاڵی جێی دەبێتەوە؟ ئەمەی گوت فڕی». ئەم چیرۆکەیان بۆیە گێڕاوەتەوە تا ئاشکرا بێ کە مرۆڤ کاتێ تەما بەرچاوی بگرێ، شتی نەلواوی بۆ دەلوێ و باوەڕی پێ دەکا.

کوڕی‌سەمماک دەڵێ:«تەما گورێسێکە لە ملتدا و پەتێکە بەپێتەوە: گورێس لە ملت داکەنە تا پەتی پێت بکرێتەوە».

**شرۆڤەی دەرمانکردنی تەما و چاونەزێری**

دەرمانی ئەم دەردە، ماجوونێکە لە تاڵی پشوودرێژی و شیرینی زانست و دژواری کردەوە. هەموو دەرمانەکانی نەخۆشی دڵ، لەم سێ شتە پێک دێن. بەدەستهێنانی ئەمیش پێنج دەرمانە:

**یەکەم** کردەوەیە. ئەوەش ئەوەیە کە خەرجی خۆی کەم کاتەوە و بەرگی زبر کاتەبەر و نانی وشک بخوا. جاربەجار پێخۆر بخوا، چونکە ئەم رادەیە بەبێ تەما و چاوچنۆکی و بەئاسانی بە دەست دێت. بەڵام گەر بەکەیفی خۆی رایبوێرێ و خەرجی زۆر بکا، ناتوانێ قنیات بکا.

پێغەمبەر فەرمووی:«هەرکەس بە ژمارە خەرج بکا، هەژار ناکەوێ». هەروەها گوتی: «سێ شت هەیە کە دەربازبوونی خەڵکی تێدایە: ترس لە خوا لە ئاشکرا و بەرپیواردا، خەرج‌کردن بە حیساب لە هەژاری و دەوڵەمەندیدا، بە ئینسافبوون لە خۆشحاڵی وتووڕەییدا».

یەکێک ئەبوودەردادی دی کە ناوکە خورمای دەچنیەوە و دەیگوت:« ئەنازە راگرتن لە ژیاندا، نیشانەی زانابوونی پیاوە». پێغەمبەر فەرمووی:« هەرکەس بەپێی حیساب خەرج بکا، پەروەردگار بێ نیازی دەکا؛ هەرکەس بێ حیساب خەرج بکا، هەژاری دەخا؛ هەرکەسیش یادی خودا کات، خوداش یادی ئەو دەکا». هەروەها فەرمووی: «دووربینی و بەکاوەخۆیی لە خەرجکردندا، نیوەی ژیانە».

**دەرمانی دووەم** ئەوەیە کە گەر بژیوی ئەو رۆژەی دابین بوو، زۆر لە بیری داهاتوودا نەبێ. چونکە شەیتان پێی دەڵێ کە «تەمەن‌درێژە و رەنگە سبەی شتێکت دەست نەکەوێ. ئەمرۆ تا دەتوانی هان بدە هەدا مەدە و لە هەر کوێڕا کە بۆت دەلوێ نیازەکانت دابین کە». ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ﴾[1] دەیەوێ لە ترسی هەژار کەوتنی سبەی، ئەمرۆکەت تووشی ئازار کا و وەکوو هەژارانت بەسەردا بێنێ و پێت پێبکەنێ، چونکە رەنگە سبەینێ قەد نەیێ وگەریش بێ رەنجی پتر لەوەی کە ئەمرۆ دەیکێشێ نەبێ.

بەو چەشنە دەبێ خۆتی لێ بپارێزی کە رۆزی بە هۆی چاونەزێرییەوە دابین نابێ، بێ شک رۆزی

---

١ - (قورئان، ٢/٢٦٨) شەیتان ئێوە لە نەداری دەترسێنێ و بۆ حراپە هانوو دەدا. (هـ)

بۆت رەچاو کراوە و پێت دەگا.

جارێک پێغەمبەر لە لای ئیبنی مەسعووددا تێپەڕا، دی پەرۆش و لێوبەبارە، گوتی:«خەم مەخۆ، هەرچی رەچاوەکرابێ دەبێ و هەرچی رۆزیت بێ، بێشک پێت دەگا. دەبێ ئەوەش بزانی کە رۆزی بەندە زۆرتر لە شوێنێکەوە دابین دەبێ کە چاوەڕوانی نەکراوە. چونکە پەروەردگار دەڵێ:وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا. وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ[1]. هەرکەسیش پارێزکار بێ، رۆزییەکەی لە شوێنێکەوە دەگا کە چاوەڕێی نەبووە».

سەفیانی سووری دەڵێ: «پارێزکار بە، هیچ پارێزکارێک لە برسانا نەمردووە». واتە: پەروەردگار ئەوەندە دڵی خەڵک لە ئاست پارێزکاردا نەرم و پڕ لە خۆشەویستی دەکا، کە بژیوی ژینی دابین دەکەن.

ئەبووحازم دەڵێ: «هەرچی هەیە دووپاژە: ئەوەی کە رۆزی منە و بێلەز و بەز پێم دەگا و ئەوەی کە رۆزی کەسێکیترە و گەر هەموو خەڵکی زەوی و ئاسمانەکان هان بدەن بەمن ناگات. دەسا نائارامی و بێئۆقرەیی چیم بۆ دەکا؟»

**دەرمانی سێیەم** ئەوەیە کە دەبێ بزانێ گەر تەما نەکا و لە سەرخۆ و بەکاوەخۆ بێ، رەنج دەکێشی؛ بەڵام گەر تەما بکا و لەسەرخۆ نەبێ، هەم رەنجدەکێشێ و هەمیش سووک دەبێ. بەمەیان دەکەوێتە بەر تیزو تاوانە و بۆی هەیە لە دواڕۆژدا سزا بدرێ و بەویتریان پاداشی پێ دەدرێ وپەسن دەکرێ. ئاشکرایە، رەنج و ئازارێک کە لەگەڵ گەورەیی و هێژایی و بەڕێزی هاوڕێ بێ، باشتر لە رەنجێکە کە لەگەڵ سووکایەتی و پلار و سەرکۆنە هاوڕێ بێ، پێغەمبەر فەرمووی: «هێژایی بڕوادار لەوەدایە کە لە خەڵکوخوا بێ نیاز بێ». عەلی دەڵێ: «هەرکەس پێویستت پێیە، ئەسیری ئەوی؛ هەرکەسیش نیازی بە تۆیە، تۆ سەرۆکی ئەوی؛ هەرکەسێکیش لێی بێنیاز بی، تۆیش هەر وەکوو ئەوی».

**دەرمانی چوارم،** ئەوەیە کە رامێنێ و بزانێ هۆی ئەم تەما و چاونەزێرییەی چییە: گەر بۆ لەوەڕاندنی سکە، خۆ کەر و گا پتر لەو دەخۆن؛ گەر بۆ ئارەزووی ژنانە، بەرازو ورچ لەم بابەتەدا لەو سەرترن؛ گەر بۆجوانی و خەملاندنە، خۆ زۆرن ئەو مەسیحی و جوو و ئاورپەرستانەی لەم بارەدا لەو تەکووزترن؛ گەر بناغەی تەمای تێکدا و بە کەم دامرکا و قنیاتی کرد، بێجگە پێغەمبەران و یارانی خودا و چاکان، نابێتە وەکوو کەسیتر. دەسا وەکوو ئەمان بێ چاترە یاخۆ وەکوو ئەوانیتر؟

**دەرمانی پێنجەم،** ئەوەیە کە بیر لە زیانەکانی ماڵ وسامان بکاتەوە: چونکە گەر زۆر بێ، لەم دونیایەدا بۆی هەیە بە خەسار بڕوا و لەو دونیاش پانسەد ساڵ پاش هەژاران دەڕواتە نێو بەهەشتەوە.

---

١ - ( قورئان،٢/٦٥ و٣ )

دەبێ هەردەم سەیری ئەوانە کا کەماڵی دونیایان کەمتر لەوە، تا سوپاسی خودا بکاو سەیری دەوڵەمەندتر لە خۆی نەکا تا نیعمەتەکانی خودای لە پێش چاو سووک و بێ نرخ نەبن.

پێغەمبەر فەرمووی:«سەیری ئەو کەسە بکەن کە لە دونیادا خوارتر لە ئێوەیە». شەیتان بەردەوام پێت دەڵێ: «بۆچی قەناعەت دەکەی؟ فلان و فیسار، ئەوەندەیان سامان هەیە». گەر لە دونیا خۆت بپارێزی، پێت دەڵێ: «بۆچی خۆت دەپارێزی؟ سەیر کە، فلان و فیسار زانا خۆ ناپارێزن و حەرام دەخۆن». هەمیشە لە دونیا ئەوەت لە پێش رادەنێ کە سەرتر لە تۆیە و لە دیندا ئەوەی کە لە تۆ خوارترە، کەچی بەختەوەربوون بە ئاوەژووی ئەمەیە: دەبێ بۆ دینداری سەیری گەورەکان بکەی، تاکەم وکوورییەکانی خۆت ببینی و بۆ دونیا سەیری هەژاران کەی تا خۆت بە دەوڵەمەند ببینی.

## شرۆڤەی هێژایی و پاداشی دڵاوایی

بزانە، هەرکەس کە سامانی نەبوو، دەبێ چاوتێر و قانیع بێ، نەک چاونەزێر و چاوبرسی. گەر ساماندار بوو، دەبێ دڵاوا بێ نەک رژد و دەست قووچاو. پێغەمبەر فەرمووی :«دڵاوایی، دارێکە لە بەهەشتدا، هەرکەس دڵ فراوان بێ دەستی لە لقی ئەو دارە داوە، بۆیە دەیبا تاکوو بەهەشت. رژدی دارێکە لە دۆژەهدا هەرکەس رژد بێ دەستی بە لقی ئەو دارە راگەیشتووە، بۆیە دەیبا تا جەهەننەم». هەروەها گوتی: «دوو ئاکار هەیە کە پەروەردگار خۆشی دەوێ: دڵاوایی و رووگەشی؛ دوو ئاکاریش هەیە کە بێزی لێیە: رژدی وناوچاو گرژی». هەروەها فەرمووی:«پەروەردگار هیچ دۆستێکی بۆ خۆی دانەنا مەگین دڵاوا و رووگەش بێ». هەروەها گوتی:«واز لە گوناحی دڵاوا دێنن، چونکە هەرکات تووشی هەڵەیەک هات، پەروەردگار دەستی دەگرێ». پێغەمبەر لە خەزادا تاقمێکی بەدیل گرت، هەمووی کوشتن بێجگە لە یەک کەس. عەلی گوتی:«هەموویان یەک دین و یەک خودا و یەک گوناحیان هەیە، بۆچی ئەم یەکەت نەکوشت؟» فەرمووی: «جوبرئیل هات و ئاگەداری کردمەوە کە ئەمەیان دڵاوایە، مەیکوژە». پێغەمبەر گوتی: «خواردنی خۆراکی مرۆڤی دڵاوا، دەرمانە و هی مرۆڤی رژد و چڵێس، نەخۆشییە». هەروەها فەرمووی: «دڵاوا نزیکە بە پەروەردگار و نزیکە لە بەهەشت و نزیکە لە پیاوچاکان و دوورە لە دۆزەخ؛ مرۆڤی رژد، دوورە لە خودا و دوورە لە بەهەشت و دوورە لە پیاوچاکان و نزیکە لە دۆژەهـ. پەروەردگار، نەزانی دڵاوای خۆشتر دەوێ لە عابیدی رژد. هەروەها خراپترین نەخۆشی رژدییە». دیسان گوتی: «عەوالانی ئۆمەتی من بە بۆنەی دڵاوایی ودڵپاکی و ئاریکاری و میهرەبانی لەگەڵ خەڵک بوو کە رۆیشتنە نێو بەهەشتەوە، نەک بە بۆنەی نوێژ و رۆژووەوە». لە خەبردا هاتووە کە: «پەروەردگار وەحی نارده سەر مووسا کە"سامری مەکوژە، چونکە دڵاوایە"».

**ئاسار-** عەلی دەڵێ:«کە دونیا رووی تێکردی، لێی خەرج کە، چونکە کەم نابێتەوە، کە لێشت وەرگەڕاوە، دیسان لێی خەرج کە، چونکە نامێنێتەوە». کابرایەک گلە و گازندەی خۆی بۆ حەسەن کوڕی عەلی نووسی، نامەکەی لێئەستاند وگوتی:«نیازت پێک دێنم». گوتیان: «بۆچی نووسراوەکەت نەخوێندەوە؟» گوتی:«چونکە پەروەردگار لە بەر گەردن کەچ وەستانی ئەو کابرایە لە پێشم، لێی دەپیرسیمەوە».

محەمەد کوڕی مونکەدێر لە«امذرە» کارەکەری عایشە دەگێڕێتەوەکە: «جارێک کوڕی زوبەیر دوو خەروار زیو و سەدو هەشتاد هەزار درهەمی هێنا بۆ عایشە. عایشە هەمووی لە سەر تەبەق دانا و لە نێو هەژاراندا دابەشی کرد. ئێوارە درەنگان بوو کە پێی گوتم: "شتێک بێنە با رۆژووەکەمان بکەینەوە". نان و رۆنی زەیتوونم بۆ برد. گوتم: "ئەمڕۆ ئەم هەمووە زێڕو زیوانەت دابەش کرد، چ دەبوو گەر درهەمێک گۆشتت بۆمان دەکڕی؟" گوتی: "گەر وەبیرت بهێنایەمەوە، بۆتم دەکڕی"».

کاتێ مەعاویە بە مەدینەدا تێدەپەڕا، حوسەین بە حەسەنی گوت: «خێرا سلاوی لێ مەکە». کە مەعاویە لە مەدینە رۆیشتە دەرەوە، حەسەن گوتی: «ئێمە قەرزدارین»، رۆیشت بە دوویا و باسی قەرزەکەی بۆ گێڕایەوە. حوشترێک لە دواوە بوو، مەعاویە پرسی: «باری ئەو حوشترە چییە؟» گوتیان زێڕە و سەرجەم دەبێتە سەدوهشتا هەزار دینار، گوتی: «بیدەن بە حەسەن تا قەرزەکەی بداتەوە».

ئەبولحەسەنی مەدایەنی دەڵێ: «حەسەن وحوسەین و عەبدوللای جەعفەر، هەرسێکیان بۆ حەج دەڕۆیشتن. لە ڕێدا برسی بوون وحوشتری هەڵگری زادی ڕێگایان پێشتر رۆیشتبوو. لە شوێنێکدا برسی و تینوو مانەوە. رۆیشتنە لای پیرەژنێکی عارەب. گوتیان: "خواردنەوەت هەیە؟" گوتی : "هەمە". مەڕێکی بوو، دۆشی و شیرەکەی پێیان دا. خواردیانەوە، گوتیان: "خواردنت هەیە؟" گوتی: "بێجگە ئەم مەڕە هیچم نییە، بیکوژن وبیخۆن". کوشتیان و خواردیان و گوتیان: "ئێمە خەڵکی قورەیشین، کە گەڕاینەوە بێ بۆ لامان با قەرەوی ئەم چاکەت کەینەوە". مێردەکەی گەڕایەوە لێیتووڕە بوو و گوتی: "مەڕەکەت دا بە کەسانێک کە نایانناسی؟" رۆژ هاتوچوو، ئەو پیرەمێرد و پیرەژنە لەبەر نەداری بەرەو مەدینە رۆیشتن، سەنێری حوشتریان کۆوە دەکرد و دەیانفرۆت. جارێک ئەو پیرەژنە رۆیشتە نێو کۆڵانێک. حەسەن لە بەر دەرکی خانووی دانشتبوو؛ پیرەژنەکەی ناسیەوە. گوتی: "پیرێ[1]! دەمناسی؟ من ئەو میوانەم کە فلان رۆژ لەگەڵ هاوڕێیانم هاتینە لات". پیرەژن گوتی: "تۆ ئەو کەسەی؟ " گوتی: "ئەرێ". پاشان حەسەن گوتی هەزار دینار و هەزار مەڕیان پێی دا و لە گەڵ خولامەکەی ناردیە لای حوسەینی برای. حوسەین گوتی: «براکەم چی پێ دای؟» گوتی:

---

[1] - پیرێ- وشەی بانگ کردنی نەنک.

"هەزار دینار و هەزار مەڕ". حوسەینیش هەر ئەوەندەی پێ دا و لەگەڵ خولامەکەی ناردیە لای عەبدڵڵای کوڕی جەعفەر. گوتی: "ئەوان پێکەوە چەندیان پێ دای؟" گوتی: "دوو هەزار مەڕو دوو هەزار دینار". ئەمیش ئەوەندەی هەردووی ئەوان دابوویان، پێی دا و گوتی: "گەر سەرەتا بۆلای من دەهاتی، ئەوەندەم پێ دەدای ئەوانم تووشی رەنج دەکرد". پیرەژنەکە رۆیشت و چوار هەزار دینار و چوار هەزار سەر مەڕی بردەوە بۆلای مێردەکەی».

پیاوێک لە نێو عارەبدا بوو بە دڵاوایی بەناوبانگ بوو، کابرا مرد. تاقمێک لە سەفەر دەگەڕانەوە، زۆر برسی بوون. لە لای خانووی کابرای مردوو، باریان خست و بەبرسیەتی سەریان نایەوە. یەکێکیان حوشترێکی بوو. کابرای مردووی بە خەو بینی، گوتی: «ئەم حوشترەت بەو کەحێلە[1]ی من دەفرۆشی»-کابرای مردوو کەحێلێکی بە ناو بانگی بوو- گوتی: «فرۆتم» و پێی دا. مردووەکە حوشترەکەی کڕی وکوشتی. کاتێ کابرا لە خەو هەستا، حوشترەکەی دی سەربراوە، کردیانە نێو قازان وکوڵانیان وخواردیان. کاتێ لەوێ کەوتنە ڕێ، کاروانێ بەرەو لایان هات، یەکێک لە ناو کاروانەکەدا خاوەن حوشتری بە ناوی خۆی بانگ کرد. کە گەیشتە لای، گوتی: «تۆ لە فلان مردوو کەحێلت کڕیوە؟» گوتی: «کڕیومە، بەڵام لە خەودا» و باسەکەی بۆی گێڕایەوە. کابرا گوتی: «کەحێلەکە ئەمەیە؛ بیگرە. دوێنێ شەو بابم لە خەودا پێی گوتم "گەر کوڕی منی ئەو کەحێلە بدە بە فلان کەس"».

ئەبووسەعیدی خەرگووشی دەگێڕێتەوە: «لە میسردا پیاوێک بوو دەستی بە سەر هەژاراندا رادەکێشا و پێداویستەکانی بۆ دابین دەکردن. یەکێک منداڵی بوو و هیچی نەبوو. کابرا گوتی "رۆیشتمە لای ئەو کابرایە و ئەویش بەبۆنەی منەوە رووی لە هەموو کەس ناو هیچ دەروویەکی بۆ نەکرایەوە. منی بردە سەر قەبرێک و دانیشت و گوتی: پەروەردگاری مەزن بە رەحمتت کا! چونکە خەمی هەژارانت دەخوارد و بژیوت بۆ دابین دەکردن. ئەمڕۆ بۆ منداڵی ئەم هەژارە زۆرم هان داو هیچم دەستنەکەوت. هەستاو دینارێکی بوو، کردیە دوو کەرتەوە و نیوەی دا بە من و گوتی ئەمەم بە قەرز پێ دای تا شتێک بۆ کۆرپەکەت دابین کەی. بەم پیاوەیان دەگوت موحتەسیب". کابرای خاوەن منداڵ گوتی پارەکەم وەرگرت و ئەوەی پێویست بوو کڕیم. موحتەسیب ئەو شەوە کابرای مردووی بە خەو بینی، پێی گوتبوو: "هەرچیت گوت گوێم لێ بوو؛ بەڵام ئێمە ئەمڕۆ ئیزنی وەڵامدانەوەمان نییە. هەنووکە برۆ بۆ ماڵی من و بە منداڵەکانم بڵێ شوێنی ئاگردانەکە بکەنن. پانسەد دیناری لێیە، بیدە بەو کابرا کە منداڵی بووە". رۆژی دوایی موحتەسیب رۆیشت و خەونەکەی گێڕایەوە و ئارگاکەیان هەڵکەند و پانسەد دیناریان دیەوە. موحتەسیب گوتی هیچ مەرج نییە

---

١ - ئەسپ یان وشتری رەسەن.

گوێتان لە خەونی من بێ. ئەم زێرە هی ئێوەیە، دەتوانن هەڵیبگرنە لای خۆتان. گوتیان: "بابی ئێمە بە مردوویی دڵاوایە، ئێمە بە زیندوویی رژدی بکەین. هەمووی ببە بۆ ئەوکابرایە". موحتەسیب دینارەکانی هێنا بۆ من. من دینارێکم هەڵگرت وکردمە دوو کەرتەوە؛ نیوەم دا بە موحتەسیب بۆ قەرزەکەی و گوتم ئەمی‌تر بدە بە هەژارانی‌تر، من زۆرتر لەمەم نیاز نییە"». ئەبوو سەعیدی خەرگووشی دەڵێ: «نازانم لەمانە کامیان دڵاواتر بوون». هەروەها گوتی: «کە گەیشتمە میسر، هەواڵی ماڵی ئەم کابرایەم پرسی، نەوە و نەبیرەکەی مابوون. چاوم پێیان کەوت لە روومەتیاندا خێرو ودم دیاربوو. ئەم ئایەتەم هاتەوەبیر وَكَانَ أَبُوهُمَا صَلِحًا[1]. ئەم خێر و ودمانەی دڵ ئاوایی و دڵفراوانیە کە لە پاش مردنیش هەر بەردەوامە، زۆرسەیر نییە؛ ئیبراهیمی خەلیلیش خووی بە میوانداریوە گرتبوو. پاش مردنی خەلیل تا هەنووکەش کە ئەم دێڕانە دەنووسم، خێرو بێری ئەو دڵاواییە لەو شوێنەدا بەردەوامە.

رەبیع کوڕی سلەیمان دەگێڕێتەوە کە :«شافیعی گەیشتە مەککە و هەزار دیناری لە گەڵدا بوو. لە دەرەوەی مەککەدا دەواری هەڵدا وفۆتەیەکی راخست و هەرکەس سلاوی لێ دەکرد، لاگوێلێکی پێ دەدا. تا نوێژی نیوەڕۆی خوێند، هیچ لەو دراوانە نەمایەوە و فۆتەکەی داتەکاند». جارێک کابرایەک هەوساری ئەسپەکەی بۆگرت تا سوار بوو. بە رەبیعی گوت: «چوار هەزار دیناری پێ بدە و داوای لێبوردنی لێ بکە».

رۆژێک عەلی دەگریا .گوتیان:«بۆچ دەگری؟» گوتی: «حەوت رۆژە هەچ میوانێک نەهاتۆتە ماڵم». یەکێک رۆیشتە لای برادەرێکی و گوتی:«چوارسەد درهەم قەرزدارم». دایپێی و بۆ خۆی دەگریا. ژنەکەی گوتی: «کە ئەوەندەت پێ ناخۆش بوو کە بۆ دراوەکانت دەگری، بۆچیت پێدا؟» گوتی: «لە بەر ئەوە دەگریم کە ئەوەندە ئاگام لێی نەبووە، کە بۆ خۆی هات داوای لێکردم».

### شرۆڤەی دزێو وخراپ بوونی رژدی وچرووکی

پەروەردگار دەڵێ: وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ[2]. هەروەها گوتی: وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ[3]. واتە: پێت وانەبێ ئەوانەی لەو شتەی خودا پێی داون رژدی دەکەن، ئەوە خێری ئەوانە؛ نە،

---

١ - (قورئان، ١٨/٨٢ ) بابیان پیاوێکی ئاکار چاک بوو.

٢ - ( قورئان، ٥٩/٩ ) کەسانێکیش خۆ لە رژدی دەپارێزن، ئەوانە رزگارکانن. (هـ)

٣ - (قورئان، ٣/١٨٠ )

ئەوە شەڕی ئەوانە و هاکا لە ڕۆژی پەسلاندا هەرچی پێیان دراوە ببێتە تەوقێک وبخرێتە ملیان.

پێغەمبەر فەرمووی: «لە ڕژدی بە دوور بن، چونکە ئەوانەی بەر لە ئێوە بەخیلیان کرد، هەموویان فەوتان. بەخیلی و ڕژدی ئەم کەسانە بووە هۆی ئەوەی کە خوێنی ناڕەوا بڕژێنن و حەرام بەحەلاڵ بزانن». هەروەها فەرمووی: «سێ شت فەوتێنەرە: ڕژدی کە گوێڕایەلی بی، واتە لە قسەی کلا نەبی و بە ئاوەژووی نەبزویتەوە، دووەم ئارەزووی بەتاڵ کە بکەویتە دووی؛ سێیەم لەخۆبایی بوون».

ئەبووسەعیدی خدری دەڵێ: «دوو پیاو ڕۆیشتنە لای پێغەمبەر و داوای پارەی حوشترێکیان لێکرد، پێی دان. کە ڕۆیشتنە دەرەوە، ڕۆیشتنە لای عومەرو زۆریان سپاس کرد. عومەر بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە. فەرمووی: «فلان‌کەس پتر لەمەی ئەستاندو سپاسی نەکرد. هەرکات یەکێک لە ئێوە بە پێداگری شتێکم لێ بسێنێ، ئەوە ئاورە کە لە دەستیدایە". عومەر گوتی: "کە ئاورە بۆچی پێیان دەدەی؟" فەرمووی: "چونکە پێداگری دەکەن و پەروەردگار پێی ناخۆشە من ڕژدی کەم". هەروەها گوتی: "ئێوە دەڵێن ڕژد و بەخێل لووتبەرزترن لە ستەمکار، چ ستەمێک لە لای پەروەردگار گەورەترە لە ڕژدی؟ پەروەردگار بە گەورەیی خۆی سوێندی خواردووە کە هیچ ڕژد و چرووکێک نەخاتە نێو بەهەشتەوە"».

ڕۆژێک پێغەمبەر تەوافی دەکرد، کابرایەک دەستێکی بە ئالقەی ماڵەکەوە گرتبوو ودەیگوت: «پەروەرندەم! لە بەر گەورەیی ئەم خانووە لە گوناحانم خۆش بە». فەرمووی: «گوناحت چییە؟ بیلێ». گوتی: «گوناحی من گەورەتر لەوەیە کە بتوانم بیلێم». فەرمووی: «گوناحی تۆ گەورەترە یا زەوی؟» گوتی: «گوناحی من». فەرمووی: «گوناحی تۆ گەورەترە یا ئاسمانەکان؟» گوتی: «گوناحی من». فەرمووی: «گوناحی تۆ گەورەترە یا عەرش؟» گوتی: «گوناحی من». فەرمووی: «گوناحی تۆ گەورەترە یان پەروەردگار؟» گوتی: «پەروەردگار». فەرمووی: « کەواتە بیلێ بزانم چییە؟» گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! من سامانی زۆرم هەیە، بەلام کاتێ هەژارێک لە دوورەوە دێ، دەلێی ئاورەو بەر دەبێتە گیانم». پێغەمبەر گوتی: «دووربە لە من تا بە ئاوری خۆت نەمسووتێنی. سوێند بە خودایەک کە منی نارد بۆ پێغەمبەرایەتی! گەر لە ڕوکن و مەقامدا هەزار ساڵ نوێژ بخوێنی و ئەوەندە بگری کە لە فرمێسکەکانت جۆگە بێتەدی و داری زۆر بڕوێ، کەچی بە ڕژدی و بەخیلییەوە بمری، جێگای تۆ هەر دۆزەخە. هۆی ڕژدی و بەخیلی کوفرە و کوفریش لە نێو ئاوردایە. هەوار بە ماڵت! نەتبیستووە کە خودا گوتی: وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ[2].

---

١ - ( قورئان، ٤٧/٣٨) هەرکەسێکیش ڕژدی دەکا، ڕژدی دەربارەی خۆی دەکا. (هـ)

٢ - (قورئان، ٥٩/٩ )

کەعب دەیگوت:«هەر رۆژ بەسەر هەر کەسدا دوو فریشتە داسپێردراون، بانگ دەکەن:" خودایا! گەر ماڵوسامانی پێکەوە نا، بۆی بیفەوتێنە و گەریش خەرجی کرد، پێی بدەرەوە"».
یەحیای کوڕی زەکەریا شەیتانی دی، گوتی: «کێهە کە زۆرتر بە دوژمنی دەزانی و کێهە کە زۆتر بە دۆستی خۆتی دەزانی؟» گوتی: «پارێزکاری رژدم زۆرتر خۆش دەوێ، چونکە بە رەنجو ئازاری زۆر عیبادەت دەکا، کەچی بە رژدی خۆی هەمووی بە خەسار دەدا؛ داوێنتەڕی دلاوام پێ دوژمنە، چونکە بە خۆشی رایدەبوێرێ و لە تەڕ دەخوا و لە وشک دەنوێ، کەچی زۆر دەترسم خوا لە بەر دلاوابیەکەی بەزەیی پێدا بێتەوەو بەرەو پاشگەز بوونەوەی هان بدا».

## شرۆڤەی پاداشی لەخۆبوردن

بزانە لەخۆبوردن گرینگتر لە دلاوابیە. چونکە دلاوایی ئەوەیە کە ئەو شتەی خۆت پێویستت نەبێ ببەخشێ، کەچی لەخۆبوردن ئەوەیە کە ئەوەی خۆت نیازت پێیە، بە کەسیتری ببەخشی.
هەروەک چۆن ئەوپەڕی دلاوایی ئەوەیە کە هەرچەن خۆی نیازی هەیە، دەبەخشێ، ئەوپەڕی رژدیش ئەوەیە کە هەرچەند خۆشی زۆری نیاز هەیە، کەچی لە خۆی دریخی دەکا؛ تەنانەت ئەگەر نەخۆش کەوێ، دەرمانی خۆی ناکات. لە دلدا بە زۆر شت حەز دەکات، بەلام لە مالی خۆی خەرج ناکا و چاوەڕوان دەمێنێ کە لە کەسیدی داوا بکا.
هێژایی لەخۆبوردن گەلێک زۆرە. پەروەردگار بەم چەشنە پەسنی لەخۆبوردوانی کرد: وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ[1].
پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس شتێکی بێ و زۆریش تامازرۆی بێ و واز لە تاسەکەی خۆی بێنێ و بەختی بکات، پەروەردگای لیی دەبووری». عایشە گوتی: «لە مالی پێغەمبەردا قەد سێ رۆژی بەردەوام تێرمان نەخوار، لەکاتێکدا کە دەمانتوانی بخۆین و بەختمان دەکرد».
پێغەمبەر میوانی هات و هیچی لە ماڵ نەبوو، یەکێک لە یارانی ئەنسا هات و بردی بۆ مالی خۆیان. ئەویش خواردنی زۆر کەمی بوو. بە بیانوویەک چراکەی کوژاندەوە و خواردنەکەی لە پێش میوانەکەی رانا و لەگەل خێزانەکەی دەسیان بۆ خواردنەکە رادەکێشا و نەیاندەخوارد، تا میوانەکەی تێر بخوات. بەیانییەکەی پێغەمبەر بەو کابرای فەرموو: «پەروەردگای ئەو هەلسوکەوت و دلاوابیەی ئێوەی لەگەل میوانەکەت پێ سەیر بوو، بۆیە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ».

---

[1] - (قورئان، ٩/٥٩)هەرچەند خۆیان زۆر تەنگدەستن، لەخۆیان بۆ بەخت دەکەن.

مووسا گوتی: «ئەی پەروەرندەم! پێگەی محەممەدم پێ بنوێنە». فەرمووی: «توانت نییە، بەڵام یەکێک لە پێگەکانیت پێ دەنوێنم». کە پێی نواند، وەختەبوو لە بەر تیشکی ئەو پێگەیە ببووریتەوە و گوتی: «ئەی پەروەرندەم! بەچی گەیشتە ئەم ئاستە؟» فەرمووی: «بە لەخۆ بوردن ئەی مووسا! هەر بەندەیەک لە تەمەنیدا تەنیا تاقە جارێک لەخۆی ببووری من شەرمی لێ دەکەم کە بە حسێبی رابگەم و بۆ هەر شوێنێک لە بەهەشت کە پێی خۆش بێ دەینێرم».

عەبدوڵڵای جەعفەر جارێک لە سەفەردا لە خورماسانێ لایدا. خوڵامێکی رەش‌تاڵە پاسەوانی ئەو باخە بوو. سێ گەڵا نانیا بۆ خوڵامەکە هێنا، سەگێک لەوێ بوو، یەکێکی دابە سەگەکە، سەگەکە برسی بوو، یەکێک‌تر لە نانەکانی بۆ هاویشت، دیسان برسی بوو، ئەوی‌تریشی بۆ هاویشت و سەگەکە خواردی. عەبدوڵڵا گوتی: «ئەی خوڵام! هەر رۆژ مزی تۆ چەندە؟» گوتی: «هەر ئەو سێ نانەی کە بینیت». گوتی: «بۆچی هەمووت دابەو سەگەکە؟» گوتی: «لێرەدا سەگ نییە، لە شوێنێکی‌دوورەوە هاتووە، نەمویست برسی بمێنێتەوە». گوتی: «دەسا ئەمرۆ بۆ خواردن چ دەکەی؟» گوتی: «پشوودرێژی». گوتی: «پاک و بێخەوشی پەروەردگار! لەبەر دڵاوایی لۆمەی من دەکەن، ئەو خوڵامە لەمن دڵاواترە». گوتی تا ئەو باخی خورما بستێنن و خوڵامەکەشی کڕی و باخەکەی دابە خوڵامەکە.

پێغەمبەر لە پیلانی کافرەکان خۆی پاراست، عەلی لەسەر جێگای نووست؛ تا ئەگەی ویستیان پێغەمبەر بکوژن، ئەم خۆی بکاتە فیدای ئەو. پەروەردگاری مەزن فەرمووی بە جیبریل و میکائیل: «ئەنگۆم کردە برای یەکتر و تەمەنی یەکێکتانم لە هی ئەو درێژتر کرد، کێهە لە ئێوە کە تەمەنی درێژی خۆی ببەخشێتە ئەویتر؟» هەر یەکەیان تەمەنی درێژی بۆ خۆی ویست. پەروەردگار فەرمووی: «بۆچی ئێوەش وەکوو عەلیتان نەکرد، کە ئەوم کردە برای محەممەد، ئەوە لە سەر نوێنی ئەو نووستووە و گیانی خۆی بۆی بەخت دەکا. دەسا بڕۆنە سەر زەوی و بیپارێزن لە پیلانی کافران». هاتنەخوار. جبریل لە لای سەری راوەستا و میکائیل لە لای پای و گوتیان: «خۆزگەت پێ بێ ئەی کوڕی ئەبووتالیب! چونکە پەروەردگار و فریشتەکانی شانازیت پێوە دەکەن» و ئەم ئایەتە هاتەخوار: وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ[1].

حوسێنی ئەنتاکی لە گەورەکانی مەشایەخ بوو و شەوێک سی و چەن کەس لە ئەسحاب لە لای کۆبوونەوە. بۆ هەمووان نانیان نەبوو. نانەکەیان بۆ هەموویان کوت کرد و لەناوەڕاستدا رایان‌نا و چراکەیان کوژاندەوە. کە چراکەیان پێکردەوە، نانەکەی هەر وەک خۆی مابووەوە و کەس دەستی بۆ نەبردبروو، لە بەر ئەوەی براکەی تێر بخوات.

[1] - (قورئان، ٢٠٧/٢) هی واش لەنێو مەردم هەیە بۆ رەزای خوا، گیان دەبەخشن. خودا دەگەڵ عەبدانی خۆی دلۆڤانە (هـ).

حوزەیفەی عەدوی دەڵێ: «رۆژی جەنگی تەبووک ژمارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان شەهید بوون. ئاوم هەڵگرت و بە دووی پسمامەدا دەگەڕام. کە دیمەوە، هەناسەیەکی پێوە مابوو. گوتم ئاو دەخۆیتەوە؟ گوتی دەخۆمەوە. لەولاوە یەکێکتر ناڵاندی و گوتی "چەن تینوومە!" بە ئاماژە تێیگەیاندم کە بۆ ئەوی ببەم. بۆم برد. هشام کوڕی عاس بوو، خەریکی گیانەڵا بوو. گوتم ئاو بخۆرەوە. یەکێکتر ناڵاندی. گوتی بۆ ئەوی ببە. کە رۆیشتمە لای ئەویتر گیانی دابوو. تا هاتمەوە لای هشام ئەویش مردبوو. هاتمەوە لای پسمامی خۆم. ئەویش بەرەو جیهانی خامۆشان رۆیشتبوو».

دەڵێن کەس بەو چەشنەی هاتۆتە دونیاوە لە دونیا نەڕۆیشتووە، مەگەر بێشری حافی. لە ماڵی دونیا بە تەنیا کراسێکی بوو. لە گیانەڵادا دەرۆزەکەرێک هات و داوای خێری کرد. کراسەکەی کەند و پێی داو بۆ خۆی کراسێکی بە ئەمانەت کردە بەر، تا کۆچی دوایی کرد.

**راڤەی ئاستی دڵاوایی و رژدی کە دڵاوا کێیە و بەخیل کێیە**

بزانە، هەموو کەس خۆی بە دڵاوا دەزانێ، تەنانەت ئەگەر خەڵک بە رژد و چنۆکی بزانن. کەواتە دەبێ راستەقینە ئەم بابەتە بناسرێ -ئەمە دەردێکی گەورەیە- تا نەناسرێ، دەرمان ناکرێ. هیچ کەس وا نییە کە هەرچی لێ بخوازن بیدا، گەر وابایە هەموو کەس رژد بوو. لەم بابەتەدا رای جۆراوجۆر هەیە. بەڵام رای زۆرتر ئەوەیە کە هەرکەس لەو شتەی شەرع لە سەری فەرزی کردووە بەرگری بکات، ئەوە رژد و بەخیلە؛ گەر بە ئاسانی بتوانێ بیبەخشێ، ئەوەرژد نییە. بەڵام ئێمە ئەم راوبۆچوونە پەسند ناکەین. هە رکەس نان بداتە نانەوا و گۆشت و بداتە قەساو، ئەوەشتێکی کەمنرخە و رژدییە. هەرکەس بژیوی ژن و منداڵی ئەوەندەی کە شەرع و دادوەر دیارییان کردووە بە تەواوی نەدات و تەنیا پاروویەکی لێ کەم کاتەوە، ئەوە رژدە. هەرکەس نانی لە پێش دانرابێ و خەریکی خواردن بێ و هەژارێک لە دووەرە بێت و ئەمیش لەبەر ئەوەوەی کە ئەو هەژار لە نانەکەی نەخوا، بیشارێتەوە، ئەوەش هەر رژدە. کەواتە رژد هەرچی بۆ دان و بەخشین بلوێ و نەیدات، ئەوەرژدییە.

هەر سامان و ماڵێک بۆ شتێکە. گەر هۆی بوونی ماڵێک بەخشێن بێ و نەبەخشرێ ئەوە رژدییە. بەخشین ئەوەیە کە یا شەرع و یا پیاوەتی ئیزن بە دانی بدات کە دەبێ ببەخشرێ. فەرزی شەرع ئاشکرایە. شەرع ئەوەندە دیاری کردووە کە رژد و چنۆکان توانی دان و بەخشینیان نییە. هەروەک فەرمووی: إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُواْ وَيُخْرِجْ أَضْغَـٰنَكُمْ[1].

بەڵام مەرجی پیاوەتی، بەگوێرەی خەڵک و رادەی ماڵ و ئەو کەسەی کە رژدی لە گەڵ دەکرێ، جیاوازە. زۆر خوو و خدە هەیە کە بۆ دەوڵەمەندان کرێتە و بۆ هەژاران نە؛ لەگەڵ خاو و خێزان

---

[1] - (قورئان، ٣٧/٤٧) هەرچەند بە قیرسیچمەییش داوای ماڵێکتان لێ بکا، رژدی دەکەن و رکوونیتان دەردەخا (هـ).

سهێتە و لەل بیانی نە؛ لەگەڵ دۆستان دزێوە و لەگەڵ خەڵکی‌تر نە؛ لە میوانیدا ناحەزە و لە شوێنی‌تر نە؛ لە مامەڵەدا نالەبار و دزێو نییە؛ لە بەساڵاچووان دزێوە و لە گەنجان نە؛ لە پیاوان کرێتە و لە ژنان نە.

وەکوو ئەوەی کە راگرتن و کۆوەکردنی سامان مەبەستە، کەچی نیازێک دێتە کایەوە کە فەرزتر و پێویست‌ترە لە راگرتنی ماڵوسامان؛ کە ئەو نیازە گرینگتر بوو، خۆلێبواردنی رژدییە؛ بەڵام گەر راگرتنی ماڵ گرینگتر بوو، خەرج کردن زێدەڕۆییە. هەردووی ئەمانە نەگونجاو و نالەبارن.

کە میوانێک هات، پیاوەتی و میوانداری گرینگترە لە دەسقووچان و راگرتنی ماڵ، ماڵ بۆ میوان بەخت نەکردن بەم بیانووەی کە من زەکاتم داوە، کرێتە و رژدییە. کە هاوسێیەک برسی بێ و ئەم خواردنی زۆری بێ، خۆلادان لە بەخشینی خواردن، رژدییە.

کە فەرزی شەرع و پیاوەتیت دا و دیسان ماڵی زۆرت مایەوە، بەدەستهێنانی پاداشی پەسلان بە سەدەقە و خێردان زۆر گرینگە. هەڵگرتنی ماڵ بۆ کاتی سەختی و تووشی رۆژگاریش گرینگە، بەڵام لە لای گەورەکان ئەم کارە رژدییە و بۆ خەڵکی رەمەکی رژدییە نییە. چونکە خەڵکی رەمەکی چاو بۆ دونیا یڕدەکا. ئەمەش بە گوێرەی روانین هەرکەس جیاوازە.

کەواتە گەر کەسێک بە فەرزی شەرع و پیاوەتی رەزا بوو، ئەوە لە رژدی خەلستووە. بەڵام کاتێ دەکاتە ئاستی دڵاوایی کە پتر لەمانە ببەخشێ و هەرچی زۆرتر ببەخشێ، زۆرتر پلەی دڵاوابوونی بەرز دەبێ و پاداشی ئەوەی پێ دەگا، چ کەم بێ و چ زۆر، هەرکەس بە مەنی خۆی. کاتێک دەبێتە دڵاوا کە بەخشینی پێ گران نەبێ. گەر بۆ بەخشین زۆر لە خۆی کات، ئەوە دڵاوا نییە. هەروەها گەر چاوەڕوان پەسن و تاریف و پێداهەڵگوتنی خەڵک بێ، ئەوەش دڵاوا نییە. دەهندە و دڵاوا ئەو کەسەیە کە هیچ مەبەستێکی‌تری نەبێ؛ ئەمەش بۆ مرۆڤ نەلواوە و تەنیا لە خوا دەوەشێتەوە، بەڵام چونکە مرۆ بە پاداشی پەسلان و ناوی چاک چاوتێر دەبێ، بە مەجاز پێی دەڵێن دڵاوا، چونکە لە هەمان کاتدا چاوەڕوانی قەرەبووی کار ناکاتەوە. دڵاوا لە دونیا ئەمەیە.

بەڵام دڵاوا لە دیندا ئەوەیە کە خەمی دۆڕاندنی گیانی نییە لە رێی دۆستایەتی پەروەردگاردا و لەم بەخت کردنەش بێجگە دۆستایەتی بینایی چاوان، چاوەڕوانی چیدی ناکا. بەختی کردنی خۆ، مەبەست و نیازە و چێژی لەوەدایە؛ کە چاوەڕوانی شتێکی‌کرد، ئەوە مامەڵەیە نەک دڵاوایی و دەهندەیی.

### راقەی دەرمانی رژدی

ئەم دەرمانەش پێکهاتووە لە **زانست** و **کردە**:

**زانست** ئەوەیە کە یەکەم، هۆی ڕژدی بناسیێ، چونکە هەر نەخۆشیەک کە هۆکەی بەرپیوار بێ، دەرمان ناکرێ. هۆکەی بریتییە لە خۆشەویستی ئارەزووەکانی نەفس -چونکە بێسامان چجار ئەو داخوازانەی پێک نایەن- و گەیشتن بە تەمەنی درێژ. کاتێ مرۆڤ ڕژد زانی کە ژیانی پتر لە ڕۆژێک یان ساڵێکی لێ نەماوە، ئاسانتر دەتوانێ لە دونیا ببرینگێتەوە، مەگین ئەوەی خاوەن منداڵ بێ؛ چونکە ئەوسا ژیان و تەمەنی مرۆڤ بە هی خۆی دەزانێ و ڕژدییەکی پتر بنج دادەکوتێ. بەم بۆنەوە پێغەمبەر فەرمووی: «منداڵ، کانگای ڕژدی و ترس و نەزانییە».

برێ جار هەیە، دۆستایەتی ماڵوسامان دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی ئارەزوویەکی پووچەڵ، یاخۆ بۆ خودی شاوەت، ماڵوسامان دەبێتە گراو و خۆشەویست. مرۆڤی پیر هەیە کە دڵنیایە تا ئەو کاتەی بژی، بژیوی هەیە و دەخڵ و دانی تا ڕۆژی پەسلان بۆ ژیانی خۆی و ژن و منداڵی بەش دەکا – بێجگە ئەو دراوانەی کە هەیەتی- هەروەها گەر نەخۆش بێ، دەتوانێ دەرمانی خۆی بکا و زەکات نادا و شاردنەوەی دراو و زێر لە ژێرخاکدا مەراقی ئەوە، کەچی دەزانێ کە دەمرێ و دوژمنی دراوەکانی دەردێنێ و خەرجی دەکا؛ بەلام ڕژدی دەبێتە بەربەستێک لە بەرانبەر خەرج کردنی ماڵەکەی خۆی. ئە« نەخۆشییە ئێجگار گەورەیە و دەرمانیشی زۆر ئەستەمە.

ئێستا کە هۆی ئەم نەخۆشیەت ناسی، دەرمانی خۆشەویستی شاوەتەکان بە چاوتێری بە کەمە و پشوودرێژی لە سەر وازهێنان لە ئارەزووەکانی نەفس، تا ئەو کاتەی لە ماڵوسامان بێنیاز بێ. دەرمانی هیوا بە ژیانی درێژ، زۆر بیرکردنەوەلە مردنە. بیر لە هاوالانی خۆی بکاتەوە کە وەکوو ئەم لە گوێی گادا نوستبوون و لە گزوگوممەت مردن و هەناسە ساردیان بۆ مایەوە و نەیارانیان ماڵوسامانیان لەنێو خۆیاندا دابەش کرد.

ترس لە هەژاری منداڵانی بەوە چار کا کە بزانێ ئەوەی ئافراندوونی، خۆی ڕۆزیان بۆ دەنێرێ. گەر لە چارەیاندا هەژاری نووسیبێ، بە ڕژدی ئەم دەوڵەمەند نابن و ئەو سامانەش بە خەسار دەدەن. گەریش دەوڵەمەندی نووسیبێ لە شوێنیکەوە بۆیان دابینی دەکا. مەگەر نابینن کە زۆر دەوڵەمەند هەیە هیچ میراتی لە کەسە پێ نەگەیشتووە و زۆر هەچار هەیە کە هەرچی بە میرات پێگەیشت هەمووی فەوتاند. دەبێ بزانێ کە گەر منداڵ گوێڕایەڵی پەروەردگار بێ، هەر ئەوەی بۆ بەستە. ئەگینا هەژاری خێری دونیا و دینی ئەوی تێدایە، تا ماڵوسامان بەرەو خراپەی ڕانەکێشن.

لە ئەخباردا هاتووە کە لە خراپەی ڕژدی و پەسنی دلاوایی ڕامێنێ و بیرکاتەوە، چونکە مرۆڤی ڕژد بێجگە دۆزەخ جێگای‌تری نییە؛ هەرچەند عیبادەتی زۆریشی بێ. هەروەها ئەو سامانە چ کەڵکێکی بۆ هەیە کە نەتوانێ ڕەزای پەروەردگاری پێ بکرێ و خۆی لە جەحەننەم ڕزگار کا؟

هەروەها لە بارودۆخی رژدو نەگریسان رامێنێ کە چەند رەزا گرانن و لەبەرچاو سووک و بێفەڕن. خەڵکی وەکوو دوژمن سەیریان دەکەن و پلاریان تێدەگرن. دەبێ بزانێ ئەمیش وەکوو ئەوان رەزاگران و سووک و بێنرخ دەبێ.

**دەرمانی کردەوەیی** ئەوەیە کە بە وردی لەوانەدا راما، گەر نەخۆشییەکەی زۆر درێژخایەن نییە و دەرمان هەڵدەگرێ، مەیلی خەرج کردنی تێدا دەبزوێتەوە، دەبێتە خەریکی کردەوە بێ. گوێ بۆ یەکەم بیرێ کە بە دڵیدا دێ رابگرێ و خەریکی خەرج کردن بێ.

ئەبولحەسەنی بووشنجە[1] لە کناراودا بوو، بانگی لە یەکێک لە موریدەکانی کرد و گوتی: «کراسەکەم بگرە و بە هەژارانی بدە». گوتی: «بۆچی رانەوەستای تا بیتە دەرەوە؟» گوتی: «ترسام بیرێکیتر بێتە کایەوە و بەرگری لەم کارەم بکات».

رژدی لە کۆڵ نابێتەوە مەگین بە دانی سامان؛ هەروەک ئەویندار تا بە سەفەر لە گراوەکەی دوورنەکەوێتەوە، ناتوانێ دڵی لێ دەرباز کا. دەرمانی ئەوینی سامانیش، دوورکەوتنەوەیە لە ماڵوسامان. بەڕاستی کە گەر مرۆڤ هەرچی سامانی هەیە بیخاتە نێو بەحرەوە و بیفەوتێنێ، چاتر لەوەیە کە بە رژدی و چنۆکی رایبگرێ. یەکێک لە رێگاچارەکانی رژدی ئەوەیە کە سەرەتا خۆی بە ناوی چامە بخاپێنێ و بڵێ: «خەرج کە تا خەڵکی بە دلاوات بزانن و بەرزت راگرن». بەلای پلە و پاگە بە سەر بەلای خۆشەویستی ماڵوسامان زاڵ بکات، تا ئەو کاتەی لەم دەردە رەست، ئەویتریش دەرمان بکات. هەروەک چۆن کاتێ منداڵ لە شیر دەگرنەوە بە شتێکی دڵخۆش دەکەن کە حەزی لێ بێ، تا ئیدی بیر لە شیر نەکاتەوە.

ئەمە رێگەچارەیەکی جوانە بۆ دەرمانی ئاکاری پیس و سهێت، تا تایبەتمەندییەک بە سەر تایبەتمەندییەکیتردا زاڵ بکەن و بەهێزی ئەو، دڵ دەرباز کەن.

هەرکەس بە مەرایی خۆی لە رژدی دەرباز کات، پیسی بە پیسی پاک کردۆتەوە؛ بەلام چونکە بە مەرایی قنیات ناکا، قازانجی کردووە؛ تەنانەت گەر بە مەراییش قنیات کات دیسان قازانجی کردووە. هەرچەند رژدی و حەز بە پەسنی چاکە هەردوویان دانستەی بەشەرن، بەلام لەنێو دانستە مرۆییەکاندا هەم زبڵدان هەیە و گوڵزار. رژدی زبڵدانی کۆلانی مرۆڤایەتییە و دلاوایی -بۆ ناوی چاکە- گوڵزاری گەڕەکی مرۆڤایەتییە.

دلاوایی بۆ مەرایی، حەرام نییە؛ چونکە مەرایی بۆ عیبادەت حەرامە و بەس. دان و دارابوون بۆ خودا لە دانستەکانی مرۆڤ بەدەرە و پەسن کراوی تەواو هەر ئەوەیە. کەواتە مرۆڤی رژد بۆی نییە پلار بگرێ و بڵێ «فلان کەس بۆ مەرایی خەرج دەکات». چونکە خەرج کردن بۆ مەرایی جوانترە لە

[1] - لە مەقاماتی ئەبووسەعیدی ئەبولخەیردا واهاتووە کە ئەو کەسە ئەبووسەعید بووە.

خۆبواردن لە خەرج کردن بەبێ مەرایی، هەروەک لەنێو گوڵزار بووندا هێژاترە لەوەی کە لەنێو زبڵداندا بی.

دەرمانی رژدی هەر ئەوەیە کە هاتە گوتن: خەرج کردن بە زۆر و ئازار تا ئەوەی کە خووی پێبگری.

هەندێ لە پیران بەوە دەرمانی موریدەکانیان کردووە کە نەیانهێشتووە کەس ئەوەندە لە سووچێکدا بمێنێتەوە و دڵی پێببەستێ. کە موریدێک گەرەکی بوایە دڵی بە سووچێک ببەستایە، لەوێی دەگواستەوە بۆ سووچێکیتر و ئەو شوێنەی بە کەسێکیتر دەدا. گەر بیزانییبا کەسێک پێڵاوی بەدەوی بە پێیە و دڵی سەیری دەکا، دەیگوت کە بیدەبە کەسێکیتر.

بەم بۆنەیە کە هەژار دڵ فراوانترە لە دەوڵەمەند؛ بەڵام کە ماڵوسامانی لە دەوری خۆی کۆکردەوە، چێژی ئەوە دەناسێ و رژدی دەکاتە پیشە. هەرچی نەبێ، دڵ گیرۆدەی نابێ.

پەرداخێکی پیرۆزەی بە زێڕ خەملاویان بە دیاری دایە خونکارێک. هۆزانێک لەوێ بوو. گوتی: «ئەم پەرداخە چۆن دەبینی؟» هۆزان گوت: «دەبینم کە کارەساتێکە و هەژارییەک، تا ئەمەت نەبوو لە هەردوویان رزگار بووی». گوتی: «بۆچی؟» گوتی: «گەر بشکێ، زیانێکی زۆر گەورەیە چونکە وێنەی نییە، گەریش بیدزن، هەژاری و نیازمەندییە تا ئەو دەمەی بیدۆزنەوە». بە رێکەوت ئەو پەرداخە شکا و ئەو خونکارە زۆر خەمین بوو و گوتی: «ئەو هۆزانە راستی گوت».

### راڤەی ئەفسوونی ماڵوسامان

بزانە سامان وەکوو مارە، هەم ژاری هەیە و هەم دەرمان. هەروەک بێژرا، هەرکەس سیحر و ئەفسوونی مار نەزانێ و بەدەست بیگرێ، دەکوژرێ. بەم بۆنەوە گوتوویانە کە رەوا نییە کەسێک بڵێ: «لەنێو یارانی پێغەمبەردا کەسانێک هەبوون –وەکوو عەبدولڕەحمانی عووف- کە دەوڵەمەند بوون، کەواتە دەوڵەمەندی هیچ زیانی نییە». ئەمە وەکوو ئەوەیە کە منداڵێک مارگیرێک ببینێ کە دەست بۆ مار رادەکێشێ و دەیگرێ و لەنێو توورەکەی دەهاوێژێ؛ ئەو منداڵە پێی وایە کە بۆیە دەیگرێ چونکە نەرمە لە دەستدا جوان و خۆشە. ئەویش دەستی بۆ راکێشێ و لەپڕ پێوە بدات و بیکوژێ.

### سیحری ماڵ پێنجن

**یەکەم** دەبێ بزانێ ماڵیان بۆچی ئافراندووە. هەروەک بێژرا سامان بۆ تەیار کردنی خواردن و بەرگ و خانوو بۆ لەشی مرۆڤ پێویستە. لەش بۆ هە ستەکان و هەستیش بۆ ئاوەز و ئاوەز بۆ دڵ تا بە ناسینی پەروەردگاری مەزن بخەملێتەوە. کە ئەمەی زانی، بە قەدەر نیازی دڵ بە سامان دەبەستێ و لە رێی نیاز و ئابوورانی گەرەکیدا خەرجی دەکات.

**دووەم** ئاگای دەخڵ و دانی بێ تا لە حەرام و لێڵی بێوەی بێ و لە شوێنێکەوە کە لە باری پیاوەتییەوە تیزی تێبگرن (وەکوو: بەرتیل و دەرۆزەیی و کرێی حەجامەت و شتی لەم چەشنە) نەبێ.

**سێیەم** دەبێ رادەراگرێ تا پتر لە نیازی کۆوە نەکا. هەرچی پتر لە نیازی بێ، چونکە نابێتە زادی رێگای دوارۆژ، بە نیازمەندانی خەرج بکات. کە نیازمەندێکی بینی، ئەوەی پتر لە نیازی خۆیە، لەوی نەگرێتەوە؛ ئەگەر توانی ئەوهی نییە کە لە خۆی ببوورێ و ئەوەی نیازی خۆیە بەختی کات، با لەوەی کە نیازی پێ نییە خەرج کات.

**چوارم** دەبێ ئاگەداری خەرجی بێ و بەبێ چاودێری خەرج نەکات و بە کەم قنیات کا و لە راستەرێ خەرج بکات، چونکە لە رێی گونجاو خەرج نەکردن وەکوو ئەوەی لە رێی گونجاو سامانی دەرنەهێنابێ.

**پێنجم** ئەوەیە کە نییەتی لە دەخڵ و خەرج و راگرتنی ساماندا پاک و بەدەو بێ: ئەوەی بە دەستی دێنێ، بۆ ئاسوودەگی خێزانی بێ و ئەوەی وازی لێ دێنێ، بە مەبەستی پارێزکاری و سووکایەتی بە دونیاه بێ تا بیر و هۆشی لە دونیا بپارێزێ و لە یادی خودا نەپرینگێتەوە. ئەوەش رایدەگرێ، بۆ گەرەکی رێی دین بێ و لە کاتی خۆیدا خەرجی کات. گەر کەسێک وای کرد، ماڵوسامان هیچ زیانیان بۆی نییە و بەشی لەماڵ، دەرمانە نەک ژار.

بەم بۆنەوە عەلی گوتی: گەر کەسێک هەرچی ماڵوسامانی سەر زەوییە کۆی کاتەوە و لە رێی خوادا بەختی کات، ئەو کەسە پارێکارە، هەرچەند دەولەمەندترینی خەلکوخوا بێ. هەروەها گەر کەسێک چش لە هەموو دونیا بکات، بەلام مەبەستی بۆ خوا نەبێ، ئەو کەسە پارێزکار نییە.

کەواتە، دەبێ قیبلەی دڵ، عیبادەت و توێشووی پەسلان بێ تا هەر جوولانەوەیەکی –گەر ئاودەست چوون یا خواردن بێ- هەمووی عیبادەت بێ و بۆ هەموویان پاداشی بەرکەوێ؛ چونکە رێگای دین پێویستی بە هەموو ئەمانەیە و گرینگ لەمانەش مەبەست و نییەتە. چونکە زۆربەی خەلکی ئەمانە نازانن و لێیان بێئاگان، یاخۆ دەیانناسن، بەلام ناتوانن بیگرنە بەر کار، چاتر وایە خۆیان لە ماڵوسامانی زۆر، بپارێزن، تا دەتوانن. چونکە گەر زۆروزەوەندەیی سامانی تووشی سەرلێشێوان و گومڕایی نەکات، لە ئاست و پلەکانی پەسلاندا جێ دەمێنێ. ئەمەش زیانێکی ئێجگار گەورەیە.

کاتێ عەبدولڕەحمانی عوف بەرەو جیهانی خامۆشان بنەوبارگەی لێکنا، ماڵێکی زۆری لێ بە جێ ما. هەندێ لە یارانی پێغەمبەر گوتیان لەم ماڵە زۆرە کە لە پاشی بە جێ ماوە، بۆی پەرۆیشن. کەعبی ئەحبار گوتی: «پاک و بێخەوشە پەروەردگار! بۆچ دەترسن؟ ماڵی لە حەلاڵ بە دەست هێناوە، بەرەوای خەرجی کردووە، ئەوەش لێی بەجێماوە هەمووی حەلالە، ترسوو چییە؟» ئەم

هەواڵەیان بە ئەبوزەری غەففاری گەیاند. لە ماڵ هاتەدەر، گەلێک تووڕە بوو، ئێسقانی حوشتری بە دەستەوە بوو تا بیدا لە کەعب. کەعب هەڵات و خۆی کرد بە ژوورەکەی عوسمانی عەففاندا و خۆی لە پشتی ئەو حەشاردا.

ئەبوزەر رۆیشتە ژوور و گوتی: «های بەچکە جوو! دەڵێی خەمتان نەبێ بۆ ئەو شتەی لە عەبدولڕەحمان بە جێ ماوە؟ رۆژێک پێغەمبەر بۆ ئۆحۆد دەڕۆیشت، منیش لە گەڵیدا بووم. فەرمووی: "ئەی ئەبووزەر!" گوتم: "بەڵی ئەی پێغەمبەری خودا!" فەرمووی: "دەوڵەمەندان خوارترین و دواییینترینان لە رۆژی پەسلاندا، مەگین ئەو کەسەی بەم دەس و بەو دەس پارە خەرج کاو سەدەقە بدا و بژیوی هەژاران دابین کا. ئەی ئەبووزەر! نامەوێ چەن قاتی کێوی ئۆحۆد ماڵم هەبێ و هەمووی لە ڕێی خودا خەرج کەم و ئەو رۆژەی کە مردم، دوو قیراتم لە پاش بە جێ مابێ". پەیغەمبەر وایگوت، کەچی تۆ کە بەچکە جووی وادەڵێی. تۆ درۆزن و فێڵبازی». ئەمەی گوت و کەس نەیوت لەل.

جارێک کاروانی حوشترەکانی عەبدولڕەحمانی عووف لە سەفەری بازرگانی یەمەنەوە هاتنەوە. قوو کەوتبووە نێو مەدینە. عایشە پرسی: «چ بووە؟» گوتیان: «حوشترەکانی عەبدولڕەحمانی عوفن». گوتی:«ڕاستی فەرموو پێغەمبەر». ئەمهەواڵەیان بە عەبدولڕەحمان گەیاند. ئاژاوە کەوتی دڵی، دەمودەس خۆی گەیاندە لای عایشە و گوتی: «ئەی عایشە! پێغەمبەر چی گوت؟» گوتی: «پێغەمبەر فەرمووی: "بەهەشتیان پێ نواندم، یارانی هەژارمم دەدی کە بلەزوبەز و بەخێرایی بەرەو بەهەشت هەڵدەهاتن، هیچ دەوڵەمەندم نەدی بێجگە لە عبدولڕەحمانی عوف کەندیدەتوانی بلەز بڕواو خۆی دەکردەکێش و بە دەست و پێ دەڕۆیشت تا گەیشتە بەهەشت"». عەبدولڕەحمان گوتی: «ئەی عایشە! ئەم حوشترانە و هەرچی باریانە و هەرچیم هێناوە، هەمووم دا بە خێر و سەدەقە. نووکوبەدی ئەم بەندەو حوشترانم لەبەر رەزای خودا رزگار کرد، بەڵکوو منیش پێم بکرێ دەگەڵ ئەسحابیتر بڕۆم».

پێغەمبەر بە عەبدولڕەحمانی عوفی گوت: «یەکەم دەوڵەمەندی نەتەوەی من کە دەڕواتە نێو بەهەشتەوە، تۆی. کەچی بە بیر و ویرو خۆکێشکردن و کۆشەوەی زۆر دەبێ بڕۆیتە ژوور».

یەکێک لە گەورەکانی سەحابە دەڵێ: «نامەوێ رۆژێ هەزار دیناری حەلاڵ بە دەس بێنم و لە ڕێی خوادا خەرجی کەم، هەرچەند نەبێتە هۆی فەوتانی نوێژی جەماعەت و رۆژووم». گوتیان: «بۆچی؟» گوتی: «تا لە پێش پەروەرندەمدا لێم نەپرسن، لە کوێت هێناوەو لە کوێت خەرج کردووە، چونکە توانی لێپرسینەوەم نییە».

پێغەمبەر فەرمووی: «رۆژی پەسلان پیاوێ دێنن کە ماڵێکی حەرامی بە دەس هێناوەو لە ڕێ

حەرامدا خەرجی کردووەو بەرەو دۆزەهـ ڕاپێچیان کردووە؛ یەکێکی‌تر دێنن کە لە حەرام بە دەستی هێناوە و لە ڕێی حەلاڵ خەرجی کردووە و ئەویشیان بەرەو دۆزەەداوەتە بەر؛ یەکێکی‌تر دێنن کە ماڵی حەلاڵی بەدەسهێناوەو لەڕێی حەرامدا خەرجی کردووەو بۆ دۆزەهی بەڕێ دەکەن؛ یەکێکی‌تر دێنن کە لە حەلاڵ بە دەسی هێناوەو لەڕێی حەلاڵدا خەرجی کردووە، دەڵێن: "ئەمەیان ڕاگرن، ڕەنگە بۆ بەدەسهێنانی ئەم ماڵە لە کاری دین کلابووبێ، لە نوێژ، ڕۆژوو یا عیبادەتێکی‌تر لای دابێ، یان لە کاتی خۆی نەیکردبێ". دەڵێ: "پەروەرندەم! لە حەلاڵم بە دەس هێناوەو لە ڕێی تۆدا خەرجم کردووە و لە ڕاستەڕێش لام نەداوە". دەڵێن: "ڕەنگە بەرگی ئاوریشمین و ئەسپ و کەل و پەلی خەملینەرت بووبێ، یاخۆ بە فیز و دەمارەوە ڕۆیشتبێتی و خۆت لە خەڵکی بەرزتر زانیبێ". دەڵێ: "بینایی چاوان! لە هیچ فەرزێ لام نەداوەو بەم ماڵەوە خۆم هەڵنەکێشاوە". دەڵێن: "ڕەنگە لە ئاستی سێوییەک، هەژارێک، داماوێک، جیرانێ یاخۆ خزمێ کۆتاییت کردبێ". دەڵێ: "پەروەرندەم! ئەم سامانەم لە حەلاڵ بەدەسهێناو لەڕێی ڕاستدا خەرجم کردو لە فەرزەکانم کلا نەبووم و بەم ماڵەوە فیزم نەکرد و لە ئاست کەسدا کورتیم نەکرد". هەموو ئەم کەسانە دێن و پێسیری دەگرن و دەڵێن: "پەروەردگار! ئەم کابرایەت لە نێو ئێمەدا ماڵ‌وسامان پێدا، مافی ئێمەشی لە سەرە، لێی بپرسە". سەبارەت بە یەک بە یەکییان لێی دەپرسنە، گەر هیچ لای نەدابوو دەڵێن: "دەبێ شوکرانەبژێری ئەم نیعمەتەت کەی، بۆ هەر پارووەیەک کە خواردووتە، بۆ هەر چێژێ کە بردووتە، شوکرانەیان بەجێ‌بێنە". هەروا دەپرسن و دەپرسن».

بەم بۆنەوە بوو کە هیچ یەک لە گەورەکان حەزی لە دەوڵەمەندی نەبوو؛ چونکە ئەگەرچی سزای بۆ نەبێ، بەلام لێپرسینەوەیەکی بەم جۆرەی هەیە؛ تەنانەت پێغەمبەر کە ڕێبەر و پێشەوای موسوڵمانانە، بۆیە ژینی هەژاری هەڵبژارد تا نەتەوەکەی بزانن، هەژاری چاترە.

عەمرانی کوڕی حەسین دەڵێ: «لەگەڵ پەیغەمبەر زۆر نزیک بووین. جارێک پێی گوتم: "وەرە با بڕۆین بۆ سەردانی فاتمە". ڕۆیشتین، کە گەیشتینە بەر دەرگا گوتی: "سلاوت لێ بێ! بێینە ژوورێ؟" گوتی: "سەرکەوە". گوتی: "من و ئەو کەسەی کە لەگەڵمە؟" گوتی: "ئەی پێغەمبەر خوا! هیچم دەبەردا نییە، بێجگە بەڕێکی کۆنە". گوتی: "بە خۆتیدا بدەو خۆت داپۆشە". گوتی: "لەشم پێی داپۆشی، بەلام سەرم پەتییە". پێغەمبەر فۆتەیەکی کۆنی بۆ هاویشت کە بەسەریدا بدا. پاشان ڕۆیشتینە ژوورو گوتی: "چۆنی ڕۆڵەگیان؟" گوتی: "نەخۆش و دەردەدارم و ئێشم بە هۆی برسیەتیوە پتر بووە. بەم نەخۆشیەوە هیچمان نییە کە بیخۆم و ورەم پێ نەماوە". پێغەمبەر گریاو گوتی: "بێ تاقەت مەبە کچم! سوێند بە خودا سێ ڕۆژانە هیچم نەخواردووەو منیش لە لای پەروەرندەم گەلێک لە تۆ هێژاترم و هەرچیم بوێ و داوای بکەم، بۆم پێک دێنێ، بەلام فەرزی دواڕۆژم داوەتە سەر دونیادا". پاشان دەستی نایە سەر شانی و گوتی: "مزگێنیت پێ دەدەم لە لایەن پەروەردگارەوە کە

گەورەی ژنانی بەهەشتی". گوتی: "دەی ئاسیەی ژنی فیرعەون و مریەم داکی عیسا؟" گوتی: "هەریەک لە ئێوە گەورەی ژنانی سەردەمی خۆتانن. هەر یەک لە ئێوە لە نێو کۆشکی خۆتانن، کۆشکی بە گەوهەر رازاوە، کە نە رەنجی تێدایە، نە دەنگ و هەرا و نە ئازار". پاشان گوتی: "دڵخۆش بە پسمام[1] و مێردت، تۆم کردۆتە خێزانی کەسێک کە هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژ گەورە و سەروەرە"» .

دەگێڕنەوە کە پیاوێ بە عیسای گوت: «دەمەوێ لەگەڵت بم»، پێکڕا ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای جۆگە ئاوێ. سێ کولێرەیان بوو، دوویان خوارد. عیسا ڕۆیشتە لای جۆگە ئاوەکە تا تارەت بشوا. کە گەڕایەوە نانەکەی نەدی. گوتی: «کێ نانەکەی هەڵگرت؟» گوتی: «نازانم». پاشان لەوێ ڕۆیشتن، لەڕێدا ئاسکێکیان بینی لەگەڵ دوو بێچووی. گاسی بێچووێکی کرد، هات بۆ لای، کوشتی و کەبابیان کرد و هەردوویان تێریان لێ خوارد. پاشان گوتی: «ئەی بێچووە ئاسک! بە ئیزنی خوا زیندوو بەوە». زیندوو بووەو هەستا و ڕۆیشت. گوتی: «سوێندت دەدەم بەو خودایە کە ئەم مۆجزەی پێت پیشان دا، بڵێ ئەو کولێرە چی لێ هات؟» گوتی: «نازانم». لەوێ ڕۆیشتن، گەیشتنە شوێنێ ورد و زیخی زۆری لێ بوو.

عیسا ئەم زیخەی هەڵگرت و گوتی: «بە ئیزنی خوا ببە بە زێڕ»، هەمووی بوو بە زێڕ. زێڕەکەی کردە سێ پاژ و گوتی: «کەرتێ بۆ من، کەرتێ بۆ تۆ، کەرتێ بۆ ئەوەی کولێرەکەی هەڵگرت». کابرا لەبەر زێڕەکە پێ هات و گوتی: «نانەکە لە لای منە». عیسا گوتی: «هەرسێ کەرتەکەی بۆ تۆ»، هەمووی بۆ داناو ڕۆیشت. دوو زەلام پێی گەیشتن، ویستیان بیکوژن و زێڕەکەی ببەن. گوتی: «مەمکوژن تا هەر یەکەو کەرتێکی ببەین». گوتیان: «یەکێک بنێرین تا خواردنمان بۆ بێنێ». یەکێکیان ڕۆیشت خواردنی کڕی. گوتی: «زۆر داخی هەیە ئەوان لەو زێڕەدا ببنە هاوبەشم. ئەم خواردنە ژاراوی دەکەم تا بیخۆن و بمرن و خۆم هەمووی ببەم». ئەو دوو کەسەش گوتیان: «بۆچی بەشی ئەویش بدەین، کە هاتەوە دەیکوژین و خۆمان بەشەکەی ئەو هەڵدەگرین». کە هاتەوە کوشتیان و خواردنە ژاراوییەکەیان پێکڕا خوارد و دەم و دەس مردن و زێڕەکە هەروا مایەوە. عیسا دەگەڵ یارانی گەڕایەوە و زێڕەکەی بینی داکەوتووە و لاشەی ئەو سێ کەسەش لەوێ کەوتووە. گوتی: «ئەی یارانم! دونیا ئاوەهایە، خۆتانی لێ بپارێزن».

لەمەی بێژرا لێت خویان بوو کە هەرچەند پیاو ژیر و هۆزان بێ، چاتروایە سەیری ماڵ نەکا و خۆی لێ بپارێزێ و پتر لەوەی نیازی پێیە، لێی هەڵنەگرێ؛ چونکوو مارباز ئەنجامی مردن بە ژاری مارە و بەس. وەسسەلام.

---

[1]- پسمام: کورمام.

## بنەمای حەوتەم - دەرمانی دۆستی و خۆشەویستی شانوشکۆی دونیا

بزانە هۆی فەوتانی زۆربەی خەڵکی، هۆگربوونە بە شانوشکۆو ناو و دەنگ و پەسنی خەڵک. لەم سۆنگەوە تووشیاری رکەبەری و دوژمنایەتی و گوناحی زۆر بوون. ڕێگەی دینیان لەبەر نەبڕا و کۆسپ و تەگەرەیان کەوتە بەر و دڵیان بە دوڕازی و خیانەت و ئاکاری نزم پیس بوو.

پێغەمبەر فەرمووی: «خۆش ویستنی شانوشکۆی دونیا، وا دوڕازی لە دڵ دەڕوێنێ کە ئاو کەورگ». دیسان گوتی: «دوو گورگی برسی کە پەلاماریان لە گەلەیەک داوە، بە قەدەر خۆشەویستی شانوشکۆی دونیا کە زیان لە دڵ دەدا، زیان لەو گەلە نادەن». بە عەلی گوت: «دوو شت خەڵکی فەوتاند: کەوتنە دووی ئارەزووی نەفس، حەز لە پەسن و سەنا. کەسێک لەم زیانە دەخەڵسێ کە نەکەوێتە دووی ناو و دەنگ و بێناو و دەنگی پێ خۆشتر بێ». پەروەردگار دەڵێ: تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ[1] واتە: بەختەوەری دواڕۆژم بۆ ئەو کەسەی داناوە کە لە دونیادا لە دووی شانوشکۆ نەبێ و بەدفەڕی نەکا. پێغەمبەر فەرمووی: «خەڵکی بەهەشت کەسانێکی تۆزاوی، پرچ ئاڵۆز، بەرگ پواون کە کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە. گەر بخوازن بڕۆنە ژووری خانییەک، ئیزنیان نادەن، کەس کچی خۆی لێیان مارە ناکا، گەر بپەیڤن کەس گوێیان بۆ ڕانادێرێ. گەر ڕووناهی رووی ئەم کەسانە لە نێو خەڵکدا دابەش کەن، نووکوبەدی خەڵک لە ڕۆژی پەسلاندا رزگار دەبن».

دیسان فەرمووی: «رەنگە ئەو مرۆڤە بەرگ پواوی تۆزاوییە خودا سوێند بدات بەهەشتی پێ بدا، کەچی هەرچی لە دونیا بوێ پێی نادا». گوتی: «زۆرن لە نێو نەتەوەکەی مندا کە گەر لێتان درهەمێ یاخۆ کلۆیەک بخوازن، پێێ نادەن، بەڵام گەر داوای بەهەشت لە پەروەرندەی کا، پێێ دەدا. گەر شتێ لە دونیا بخوازێ پێی نەدا، هەرچەند نە بە بۆنەی بەدفەڕی و بێ نرخییەوە».

عومەر ڕۆیشتە نێو مزگەفت، مەعازی بینی کە دەگریا. گوتی: «ئەی مەعاز! بۆ دەگری؟» گوتی: «لە پێغەمبەرم بیست کە گوتی: "تەنانەت تۆزکاڵێ لە دوڕوویی هامبازگرتن بۆ خودایە. خودا

---

[1] ـ قورئان (٢٨/٨٣).

بەندەیەکی پارێزکار و گوم ناوی پێخۆشە؛ ئەو پارێزکارەی کە کاتێ نەبوو کەس هەواڵی نەپرسێ، کە بوو کەس نەیناسێ. دڵی ئەم کەسانە چرای ڕێنمایەو لە هەر رەشی و لێڵی و زەنگارێ پاکژە"».

ئیبراهیمی ئەدهەم دەڵێ: «هەرکەس ئارەزووی نەفس و تامازرۆی بەناوبانگ بوون بێ، لە دینداریدا یەک دڵ و بێخەوش نییە».

ئەیووبی سەختیانی گوتی: «نیشانەی راسبێژ ئەوەیە کە نایەوێ کەس بیناسێ». تاقمێ لە شاگردان بە دووی ئوببی کوڕی کەعبدا دەڕۆیشتن. عومەر چاوی پێکەوت و بە قەمچی لێی دا. گوتی: «دەزانی چ دەکەی ئەی ئەمیرەلمۆئمنین!» گوتی: «ئەم سووکایەتییە لە پێش چاوت و ئەوەش ئاژاوەیە کەوتۆ دووت».

حەسەنی بەسری دەڵێ: «هەر نەزانێ کە روانی کەسێک کەوتۆتە دووی [و پێرەوی دەکا]، قەد دڵی لە لای خۆی نامێنێ[1]».

ئەیووبی سەختیانی بۆ سەفەر دەڕۆیشت، تاقمێ کەوتنەدووی. گوتی: «گەر ئارخەیان نەبوایەتم کە پەروەردگار دەزانێ ئەم کارەم لە لا دزێوە، لە تووڕەیی و زویر بوونی پەروەردگار زۆر دەترسام».

سەفیانی سەوری دەڵێ: «پێشوونان بەرگێکیان نەکردۆتە بەر کە سەرنجی خەڵکی راکێشێ -چ کۆنە، چ نوێ- و گوتوویانە دەبێ وا جلکدەبەرکەی کە کەس سەرنجت پێ نەدا».

بێشری حافی دەڵێ: «کەس ناناسم کە هۆگری ناوبانگ بێ و دینی نەفەوتابێ و خۆیشی رسوا نەبووبێ».

### شرۆڤەی راستەقینەی شانوشکۆ

واتای دەوڵەمەند ئەوەیە کە کەسێک خودانی خانوو و ماڵوسامان بێ و بتوانێ بە کەیفی خۆی دەستی تێوەربدا؛ واتای شکۆدار ئەوەیە کە دڵی خەڵک و خوای لە ژێر رکێفدا بێ و وەکوو ماڵی خۆی دەستی تێوەربدا. کە دڵی کەسێک بوو بە ماڵ و ملکی کەسێک، دوا بە دوای ئەوە، لەش و ماڵوسامانیشی دێنێتە ژێر رکێفی خۆی. دڵ نابێتە دەستەمۆی کەس مەگین ئەوەی بە ئاکاربەرزی ئەو کەسە بڕوای هەبێ، بە چەشنێک کە لە سۆنگەی تەواوییەک کە لەو کەسەدایە، دڵی کەوی گەورەیی ئەو کەسە بێ. ئەو تەواوتربوونە یا هی زانستە، یان پەرستنە، یا رووی گەشە یا هێزە یاخۆ هەر شتێک کە خەڵک بە هۆی گەورەیی بزانن. کەوای باوەڕ پێکرد، دڵی دەبێتە مەکۆی خۆشەویستی ئەو کەسەو بە دڵ و گیان پەرای دەکا و زاری بە پەسنی دەگەڕێ و لەشی بۆ خزمەتی تەرخان دەبێ. وای لێ دێ کە ماڵوسامانی بۆ بەخت دەکاو وەکوو کۆیلەیەک کە گوێڕایەڵی

---

١ ـ واتە: دڵی لە لای ئەوانەیە کە وتوونەتە دووی.

خێوەکەیە، مورید و هۆگر و دەستەمۆی کابرای پاگەدارە. تەنانەت کەویبوونی[1] بەندە بە هۆی زۆرەوەیە کەچی ئەم بە مەیل و حەز و ویستی خۆیە کە ملی بۆ ڕاکێشاوە. کەواتە، واتای ئەم پەیڤە کە ماڵ، ملکی دەوڵەمەندانە و شکۆو شان ملکی دڵی خەڵک و خوایە، ئەمەیە کە هاتە گوتن.

شان‌وشکۆ لە لای زۆربەی خەڵک هێژاترە لە ماڵ‌وسامان. هۆی ئەوەش سێ شتە:

**یەکەم،** بۆیە لە لای هەمووان خۆشەویستە کە دەتوانێ پێداویستی هەمووان دابین کا؛ ئەوەی خاوەن شکۆبێ، دابین‌کردنی سامان بۆی دژوار نییە، بەڵام مرۆڤی ڕژدی دەوڵەمەند بە دژوار بتوانێ ببێتە خاوەن شکۆ.

**دووەم،** ماڵ بۆی هەیە بفەوتێ، کەم بێتەوە، یان دز بیبا، بەڵام شان‌وشکۆ لەم مەترسییانە بە دوورە.

**سێهەم،** ماڵ‌وسامان بەبێ‌ڕەنج و کۆشەوە و بازرگانی زۆر نابێ، کەچی شکۆ گەشە دەکا و سەر لە ئاسمان دەنووسێنێ؛ ئەوەی دڵی بوو بە نێچیرت، بە دونیادا دەگەڕێ و پەسنت دەکا و دڵی‌ترت بۆ ڕاو دەکا، بەبێ ئەوەی کەس بتبینێ.

هەرچەند ناوبانگ زۆرتر دەڕوا، شکۆ زۆرتر دەبێ و پێڕەوی زۆرتر دەبێ. کەواتە هەم سامان و هەم شان‌وشکۆ چونکە هۆی پێکهێنانی نیازەکانن، لە لایەن خەڵکەوە حەز لێکراون، بەڵام مرۆڤ زۆرتر حەزی لەوەیە کە ناو و دەنگی زۆرتر بڕوا و لە هەموو کونج و قوژبنی ئەم دونیایە بناسرێ و ناو دەربکا، هەر چەند دەزانێ قەد ڕێی ناکەوێتە زۆر لەو شوێنانە؛ هەروەها پێی خۆشە هەموو ئەم دونیایە هی ئەو بێ، هەرچەند نیازیشی پێ نەبێ. هۆی ئەمەش ڕازێکی گەورەیە، ڕازەکەشی ئەوەیە کە مرۆڤ لە ماکی فریشتەکانەو ئەمیش دەسکردی پەروەردگارە، هەروەک گوتی: قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي[2] بە بۆنەی بەندیوارییەکی زۆرەوە کە لەگەڵ پەروەرندەی هەیەتی، گەڕان بە دووی گەورەییدا سروشتی وییە. لە ناخی هەموو کەسدا پاپای گەورەیی شراوەیەو ئەمەی فیرعەون گوتی: أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ[3] دانراوە؛ بۆیە هەرکەس بە گوێرەی سروشتی حەزی لە گەورەیی و خواییە.

واتای پەروەرێنەری ئەوەیە کە هەموو شتێ هەر خۆی بێ و کەسی‌تری لەگەڵ نەبێ، ئەگەر بوو، کەمایەسییەک پێک دێ.

کامڵبوونی هەتاو ئەوەیە کە هەر خۆیەو ڕووناهی هەموو شتێ هەر لەوەو ئەگەر ئامبازێکی بوایە، کورت و ناتەواو بوو. ئەم تەواوتربوونە دانستەی خوداییەو بوونی ڕاستەقینە هەر ئەوە و بەس. لە بووندا بێجگە لەخۆ کەسی‌تر نییە. هەرچی هەیە لە سۆنگەی تیشکی دەسەڵاتی ئەوەو پێڕەو و کەوی ئەون،

---

١- کەویبوون: ڕامبوون.

٢ ـ قورئان (٨٥/١٧) بڵێ گیان هەر ئەوەیە خودا دەیزانێ.

٣ ـ قورئان (٢٤/٧٩) ئەمن پەروەرێنەری هەرەپایە بەرزتانم. (هـ).

نهک هامبازی. ههروهک رووناکی ههتاو که پێڕهویه و بۆ خۆی له ههمبهر ههتاو بوونێکی جیاوازی نییه و نابێته ئامبازی ههتاو و هۆی نوقسانی.

سروشتی مرۆڤ وایه که دهیهوێ ههمووشتێ ههر خۆی بێ، که پێی ناکرێ دهیهوێ بۆ ئهو بێ و لهژێر رکێفیدا بن و گوێڕایهڵ و گوێ له مستی بن؛ بهڵام ئهمهشی پێ ناکرێ؛ چونکه بوونهوهران دوو بهشن: کهرتێک ئهوانهن که نین له ژێر رکێفی مرۆڤدا، وهکوو ئاسمان و ئهستێرهو گهوههری فریشتهکان و شهیتانهکان و ئهوهی له ژێر زهوی و زهریا و کێوهکاندایه.

مرۆڤ دهیهوێ به هۆی زانستهوه ههموو ئهمانه کهوی کاو پهتی بهندهگیيان بکاته گهردن؛ ههرچهند پیێ ناکرێ.

لهم سۆنگهوه دهیهوێ له کونج و بناوانی ههمووشت بکۆڵێتهوهو مهلهکووت و ئاسمان و زهوی و نهێنیهکانی وشکی و زهریای لێ خویان بێ؛ ههروهک کهسێک که نهتوانێ شهترهنج دابێنێ کهچێ بیهوێ دایبێنێ؛ ئهمهش جۆرێک هێنانه ژێر رکێفه.

بهڵام کهرتێکیتریش ههیه که مرۆڤ دهتوانێ دهسهمۆی کا و بیهێنێته ژێر رکێفی خۆی. ئهوهش ئهو شتانهیه لهسهر زهوینن، وهکوو روهک و ئاژهڵ و دار و بهرد. مرۆڤ دهیهوێ ههموو ئهو شتانه هی ئهو بن، له ژێر رکێفی ئهودا بن، گوێڕایهڵ و گوێلهمهستی بن. بهنرخترینی ئهو شتانهش دڵی مرۆڤه. دهیهوێ ئهوهشی له ژێر چهتری دهسهڵاتدا بێ و به تهنیا یادی ئهمی تێدا بێ. ئهمهیه واتای شانوشکۆ.

کهوابوو، مرۆڤ به گوێرهی سروشتی خۆی حهزی له گهورهیی خودایيه و لهو سۆنگهوه دهیهوێ بگاته پهروهرێنهری.

پهروهرێنهری ئهوهیه که ههموو شتێکی تهواو بێ و تهواوهتی له زاڵبوونه و زاڵبوون به زانست و دهسهڵات پێک دێ و دهسهڵات به ماڵوسامان و شانوشکۆ دێته دی و بۆیه حهزی له سامان و شکۆیه.

**سهرنج**: خهڵکی بۆ دیتنهوهی شانوشکۆ له راستهڕێ کلا دهبن.

رهنگه کهسێک بڵێ که گهڕان بهدووی تهواوتربوونی پهروهرێنهریدا سروشتی مرۆڤه و به زانست و دهسهڵات دهبێ و دانهپهی زانستیش کارێکی شیاوه، چونکه کهوتنه دووی تهواوتر بوونه. کهواته، دهبێ کهوتنه دووی ماڵ و شکۆش پهسندکراو و شیاو بێ؛ چونکه ئهویش گهڕان بۆ دهسهڵاتهو دهسهڵاتیش له هۆکارهکانی تهکامولە و ئهوهش وهکوو زانست دانستهی خوایهو مرۆڤ ههرچهند کاملتر بێ، له پهروهرندهی نزیکتره.

پهرسڤی ئهم کهسه ئهوهیه که زانست و دهسهڵات هۆی تهواوبوونن و له دانستهکانی

پەروەردگارین؛ بەڵام مرۆڤ ڕێگا دەباتە سەر زانستی ڕاستەقینە، کەچی ڕێ ناباتە سەر دەسەڵاتی ڕاستەقینە. زانست تەکامولێکە کە ڕەنگە مرۆڤ پێی بگاو لەگەڵی بمێنێتەوە؛ بەڵام ئەو دەسەڵاتە کامڵەی بۆ پێک نایەو کەچی وا دەزانێ بە دەستی دێنێ و دەگەڵی دەمێنێ؛ دەسەڵات بە گوێرەی خەڵک دەسەڵاتەو بە مردن و لە خەڵک دابڕان لێ جیا دەبێتەوەو لێ دەسێنرێتەوە.

هەرچی بە مردن بفەوتێ و دوایی بێ، ناڕواتە ریزی خێر و ودمی دواڕۆژ و ژیان تەرخان کردن و فەوتانن بۆ دەستخستنی نەزانییە.

کەواتە دەسەلات ئەوەندەی چاکە کە زانستی پێ کۆوە بکرێ. زانستیش هی دڵە، نەک لەش. دڵ هەتا هەتاییەو کە زانا لەم جیهانە کۆچ دەکا، زانستەکەی دەمێنێتەوە. ئەو زانستە ڕووناکیە کە خودانی خۆی پێ سەیر دەکاو چێژێکی لێ دەبا کە هەموو چێژەکانی دونیا لە بەرانبەریدا هیچ و پووچن. زانست سەر بە هیچ شتەک کە بە مردن لە ناو بچێ نییە، چونکە چەمکی زانست نە ماڵوسامانە و نە دڵ، بەڵکوو خودی پەروەردگارە و دانستەکانی و لیزانی و هۆزانی لە مەلەکووت و دونیا و هەموو جیهان و سەیر و سەمەرەی ئەو چەمکانەی ئاوەز تێیان دەگا لە ڕەوا و پێویست و نەلواوان[1]، چونکە ئەمە کۆنینە و هەتاهەتاییە، قەد ناگۆڕدرێ، چونکە قەد پێویست[2] نابێتە نەلواو و نەلواو نابێتە ڕەوا[3]. بەڵام ئەو زانستانەی لەسەر ئافرێندراوانن، تەمەن کورت و بێنرخن؛ وەکوو زانستی وشەوانی. چونکە وشە نوییە[4] و دەفەوتێ و دەگۆڕدرێ و نرخێکی وای نییە. نرخی وشە ئەوەیە کە هۆی خوێندنەوەی قورئان و سوننەتە. خوێندنی قورئان و ناسینی سوننەت، بۆ ناسینی پەروەردگارە و بۆ برینی ملەسەخت و سەرکەشەکانی ڕێی دواڕۆژە.

کەواتە هەرچی ئاڵ و وێری بەسەردابێ، ناڕواتە نێو بازنەی زانستەوە، بەڵکوو بابەتی زانست ئەو شتانەن کە هەتایین. زانستی ئەم چەمکە هەتاهەتاییانەیە کە دەڕواتە ڕیزی پاشەنازی دواڕۆژ، باس لەسەر ناسینی پەروەردگارە، چونکە هەتا هەتایی و کۆنینەیەو ئاڵ و گۆڕی بەسەردا نایێ. کەواتە هەرچی مرۆڤ، فرەتر زانستی هەتایی بناسێ و بزانێ، زۆرتر لە پەروەردگاری نزیک دەکەوێتەوە.

مرۆڤ بۆی هەیە زانستی ڕاستەقینە بزانێ، بەڵام بۆی نییە دەسەڵاتی ڕاستەقینەش بە دەس بێنێ؛ بێجگە دەسەڵاتێک، کە دەڕواتەریزی چاکەکانی دواڕۆژ. ئەوەش بریتییە لە ڕزگاری لە ئارەزووەکانی نەفس؛ چونکە هەر مرۆڤێ کە کەوتە داوی دیلی شاوەت، دەبێتە بەندەی و هەر نیازێ کە بۆی ڕەچاو کا، کەمایەسییەکە بۆ مرۆڤ. بۆیە ڕزگار بوون لەو نیازانە و زاڵبوون بەسەر شاوەتدا تەواوتر بوونێکە

---

١ ـ نەلواو: مستحیل.

٢ ـ پێویست: واجب.

٣ ـ ڕەوا: جایز.

٤ ـ نوێ: حادث.

کە لە دانستەکانی پەروەردگار و فریشتەکان دەکا؛ لەم رووەوە لە ئاڵ و وێر و گۆڕان و نیاز دوور دەکەوێ و لە فریشتەکان دەچێ. کەواتە، تەواوتربوونی راستەقینە، زانست و زانینە، رزگاربوونە لە ئارەزووەکانی نەفس؛ بەلام ماڵ و شکۆ وا دەنوێنن کە تەواون و نین و لە پاش مردن نامێنن. خەڵکی بۆ گەیشتن بە تەواوتربوون ناچارن، یا باشترە بڵێین بەرپرسن، کەچی تەواوتربوونی راستەقینەیان لێ پیوارە و لێیان تێکچووە و نووک‌وبەدیان روویان تێناوە و پشتیان لە راستەقینە کردووە و سەرلەبەریان رێگای هەڵە و دوابڕاویان گرتۆتە بەر؛ بۆیە خوداش گوتی: وَٱلۡعَصۡرِ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي [1]خُسۡرٍ.

**سەرنج:** بە قەدەر نیاز شان‌وشکۆ بە دەس هێنان خراپ نییە.

شان‌وشکۆش وەکوو ماڵە؛ هەر وەکوو ماڵ‌وسامان سەرلەبەری کرێت نییە و بە قەدەر نیاز بەدەستهێنانی دەبێتە توێشوویەک بۆ دوارۆژ و زۆرتر لە نیاز، دڵ دەپەرژێنێتە سەرخۆ و رێگەی دوارۆژ بەرەو هەڵدێرگە دەبا. مرۆڤ بێ‌نیاز نییە لەوەی کە کەسێک خزمەتی پێ بکا، هەڤاڵێ ئاریکاری کا، خونکاری بەلای ستەمکارانی لێ لابدا؛ لەم سۆنگەوە دەبێ لە دڵی ئەم خەڵکەدا بایەخ و رێزێکی هەبێ: بە قەدەر پێک هێنانەی ئەم نیازانە، جێگای خۆ لە دڵی ئەم کەسانەدا کردنەوە پێویستە؛ هەروەک یووسف گوتی: إِنِّي حَفِيظٌ [2]عَلِيمٌ.

هەروەها مرۆڤ تا رێزێکی لە دڵی ماموستایدا نەبێ، وانەی پێ‌فێرناکا و تا مامۆستاش لە دڵی شاگرددا جێگایەکی نەبێ، لە لای ناخوێنێ.

کەواتە دیتنەوەی شان‌وشکۆ -وەکوو سامان- بە قەدەر نیاز رەوایە؛ بەلام دابین‌کردنی ئەم نیازە چوار شێوازی هەیە: دووانیان نارەوان و دوویان رەوان.

ئەو دوانەی کە حەرامن، **یەکیان** ئەوەیە کە بە درۆ خۆی بە مرۆڤێکی خاوەن عیبادەت بنوێنێ، بەم جۆرە تووشی دوڕوویی دەبێ. پەرستن دەبێ لە هەر خەوشێ بە دوور بێ و تەنیا لە بۆ خودا بێ و نابێ شان‌وشکۆی پێ بەدەس‌بێنێ؛ کە وایکرد ئەو پەرستنەی حەرامە.

**دووەم** ئەوەیە کە خەڵک بخاپێنێ و خۆی سەرتر لە خەڵکی بنوێنێ؛ وەکوو ئەوەی بڵێ من عەلەویم، یاخۆ لە فلان رەچەڵەکم، یان فلان پیشە دەزانم و کەچی نەیزانێ. ئەمە هەروەکی ئەوەیە کە بەگزی و دزی ماڵێک بە دەس بێنێ.

بەلام ئەو دوو شێوازەی کە رەواو حەلالن، ئەوەیە کە نە خەڵکی بخاپێنێ و نە تووشی دوڕازی بێ. هەروەها ئەوەی کە کەمایەسییەکانی خۆی بشارێتەوە، وەکوو ئەوەی کە گەر داوێن‌تەڕە،

---

١ ـ (قورئان، ١/١٠٣ و ٢) سۆند بە هەڕەتی ئێوارە، مرۆ گشتی زیانبارە. (هـ)

٢ ـ قورئان (٥٥/١٢) من چاوەدێرێکی لێزانم.

گوناحەکانی بشارێتەوە تا لە لای خونکار جێگایەک بۆ خۆی ببینێتەوە؛ گەر مەبەستی لەم کارە وانەبێ کە خۆی بە پیاوی خوا و پارێزگار پیشان بدا، ڕەوایە.

## شرۆڤەی دەرمانی خۆشەویستی شانوشکۆ

گەر خۆشەویستی شانوشکۆ بەسەر دڵدا داسەپا، ئەو دڵە تووشی نەخۆشی بووەو پێویستی بە دەرمانە؛ چونکە بێشک ئەو دەردە ئەنجامی دەبێتە دوڕازی و درۆ و فێڵ و گزی و دوژمنایەتی و رژدی و رکەبەرێ و گوناحانیتر، وەکوو خۆشەویستی ماڵ و بگرە لەوەش خراپتر.

ئەوەی بە قەدەر نیازی بداتەپەی ماڵ و شانوشکۆ و پتر لەوەی بە هیچ نەوێ، ئەوە نەخۆش نییە؛ چونکی لە راستیدا هۆگری ماڵ و شانوشکۆ نییە و تەنیا دەیەوێ زۆرتر بپەرژێتە سەرکاری دین.

بەڵام ئەوەی هۆگری شانوشکۆ بێ و سەر لە بەری بیری پەرژابێتە سەر خەڵک و خوا کە چۆن سەیری دەکەن، چی پێدەڵێن، بیر و رایان سەبارەت پێی چۆنە، بە گشتی دڵی لە لای بیر و بۆچوونی خەڵکە و ئەمەش دەردە و پێویستی بە دەرمان هەیە. ئەم دەرمانەش ماجوونێکە لە زانست و کردەوە:

**زانستی،** ئەوەیە کە لە زیانەکانی شانوشکۆ رامێنێ و بزانێ چ بەسەر دین و دونیای دێنێ. لە دونیادا خاوەن شکۆ دەبێ دڵی خەڵکی راگری و هەردەم ڕەنج و ئازاری گوێ لە قسەی خەڵکگرتن بکێشێ: ئەگەر شانوشکۆی بە دەست نەهێنا، خۆی سووک و بێنرخ کردووە؛ گەر بۆی پێک هات دەکەوێتە بەر پلاری رژد و چاوچنۆک و نەیاران و دەبێ هەردەم لە بیری بەرگری لە دوژمنانی بێ؛ ئەوەی دوژمنایەتی دەگەڵ کەن و لە بەربەرەکانیەکدا شکست بێنێ، تووشی سووکی و داماوی دەبێ و ئەگەر سەرکەوێ، سەرکەوتن هیچ ناخایەنێ. شانوشکۆ بەندیواری دڵی خەڵکە و دڵی خەڵکی وەکی شەپۆلی زەریا زۆر ناخایەنێ و زۆر بێنرخییە مرۆڤ بینای دڵی لەسەر دڵی کەسانێکەوە دارێژێ کە سووکە بیرێک، وایان بگۆڕێ و دڵیان لێ پیس بێ، بە تایبەت کەسێک کە شانوشکۆی لە سۆنگەی فەرمانڕەواییەکەوە بێ کە بە دەستوورێ یا خۆ دڵ پیسیەک کە بۆ سەرۆک بێتە گۆڕێ لابرێ و بخرێتە پشت گوێ و بێمیهری دەگەڵ بکرێ.

کەواتە، خوازیاری شانوشکۆ هەم لە دونیادا ئازار دەچێژێ و هەم لە دواڕۆژدا. ئەمەی بێژرا کەم ئاوەزان فامی ناکەن.

ئەوەی چاوی دڵی روون بووبێتەوە، چا دەزانێ کە گەر پادشایی سەرزەوی، لە رۆژهەڵاتەوە تا رۆژاوای پێ بدرێ و نووکوبەدی خەڵکی کڕنۆشی لەبەر بەن، بایەخی شادبوونی نییە، چونکە کە مرد هەمووی پووچەڵ دەبێتەوەو پاش ماوەیەک نەخۆی دەمێنێ و نە ئەوانەی رێزیان لێدەگرت؛ وەکی خونکارێک کە مرد، کەس یادێکی لێ ناکا و بەبۆنەی چێژی چەن رۆژی دونیا، پادشایی هەتاهەتایی دواڕۆژی دەفەوتێ.

ئەوەی هۆگری شانوشکۆ بوو، خۆشەویستی پەروەردگاری لە دڵ دەرەوێ. ئەوەش بڕواتە ئەو جیهان و بێجگە خۆشەویستی پەروەردگار، خۆشەویستی شتێکتری بەسەر دڵدا داسەپابێ، سزای دوارۆژی درێژخایەنە. دەرمانی زانستی ئەمە بوو کە بێژرا.

بەلام دەرمانی **کردەوەیی** دوانە:

**یەکەم**، لەو شوێنەی کە ڕێزیهەیە و شانوشکۆی هەیە، هەڵبێ و بڕواتە شوێنێکی نەناس. ئەمەش چاترە، چونکە گەر لە زێدی خۆیدا دوورەپەرێز بێ، خەڵکی کە دەزانن لە شانوشکۆ دووری گرتووە، تووشی شەڕی دەکەن. وەکوو ئەوەی تیز و تانووتی لێ دەدەن، یاخۆ بە دوڕوویی تاوانباری دەکەن و لەم سۆنگەوە دڵی تووشی ئازار دەکەن. گەر بە کارێکی نەکراوی تاوانبارکەن، پاکانەی دەکا، هەرچەن بەدرۆ بێ، تا خەڵک دڵیان لێ پیس نەبێ. ئەمە هەمووی بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هەنووکە دڵی گراوی شانوشکۆی دونیایە.

**دووەم** ئەوەی کە ڕێگای «لۆمە خوازان[1]» بگرێتە بەر، تا لە چاوی خەڵک بکەوێ. هەر چەند نابێ حەرام بخوا -هەروەک هەندی نەفام و هیچنەزان کە گوناح دەکەن بە خۆیان دەڵێن «لۆمە خواز»- بەڵکوو دەبێ کاری وای لێ بێتەوە کە خەڵک دڵیان لێ بگۆڕدرێ و پاشگەز بنەوە؛ هەروەک دەڵێن لە رۆژگارانی رابردوو پارێزگارێکی بە ناوبانگ بوو. پادشای ئەو دەڤەرە ویستی بڕواتە لای و ڕێزی لێ بگرێ و لە ودمی هەناسەی بەهرە وەربگرێ. کە پادشا لە دوور دیاری دا، پارێزگار بلەز داوای نان و کەورگی کردو بە پەلەپەل پارووی زلی لە دەم دەنا. کە پادشا ئەمەی بینی، دڵی لێی سارد بۆوەو بێ ئەوەی لە ئەسپەکەی دابەزێ گەڕایەوە.

پارێزکارێک لە شارێکدا کەوتە بەر چاوان، سەرنجی زۆریان پێ دەدا و ڕێزی زۆریان لێ دەنا. جارێک رۆیشتە گەرماو جلکی کابرایەکیتری کردەبەر و هاتەدەر و راوەستا. پاش ماوەیەک گرتیان و دایانە بەر زیلە و کەشیلە و جلکەکەیان لێ سەندەوەو گوتیان ئەمە جەردەیە نەک پارێزگار. یەکێکی-تر خواردنەوەیەک لە رەنگی مەی دەخواردەوە تا خەڵکوخوا وا بزانن مەی دەخواتەوە.

دەرمان و شکاندنی بەلای شانوشکۆ ئەمەیەکە بێژرا.

## شرۆڤەی دەرمانی حەز بە پێدا هەڵگوتن و پەسنی خەڵکی و ناحەزی بە لۆمەی خەڵکی

زۆرکەس هەیە کە تینووی پەسن و پێداهەڵگوتنی خەڵکە و هەردەم لە دووی ناوی چاکە، هەرچەند ناچار بێ تووشیاری کاری بە ئاوەژووی شەرع بێ؛ لۆمەی خەڵکی لەلا کرێتە، هەرچەند بە

[1] ـ لۆمە خواز: ملامتی: کەسانێ کە بۆ شاردنەوەی رادەی پارێزکاری خۆیان لە خەڵکی، بەندەگی و عیبادەتی خۆیان لە خەڵکی دەشاردنەوەو بە جۆرێ هەڵسوکەوت دەکەن کە خەڵکی لۆمەیان بکەن و بە چاکیان نەزانن تا پتر لە خوا نزیک کەون.

بۆنەی کارێکی ڕەواوە بێ. ئەمەش نەخۆشی دڵە و دەرمانی نادیارە تا ئەوەی هۆی حەز و ناحەزی پەسن و لۆمە ئاشکرانە بێ.

**حەز بە پەسن و پێدا هەڵگوتن چوار هۆی هەیە:**

**هۆی یەکەم**- هەروەک گوتمان، مرۆڤ حەزی لە گەشەو تەواوتربوونی خۆیە و ڕقی لە نوقسانی هەیە. پەسن‌گوتن هۆی تەواوتربوونەو ڕەنگە لە تەواوتربوونی خۆی دڕدۆنگ بێ و چێژی زۆری لێ نەبا. کە لە کەسێکی‌تری ژنەفت، دڵی ئوقرە دەگرێ و چێژی لێ دەبا و کە لە خۆیدا بۆنی تەواوتربوونی وەبەرکەپۆ کەوت، شۆپی پەروەرێنەری لە خۆیدا دەبینێ؛ هەستی پەروەرندە بوونیش بە هۆی سروشتی مرۆڤەوە خۆشەویستە لە لای. بەڵام کە لۆمەیان کرد، نوقسانی خۆی لێێ خویان دەبێ و بەم هۆوەوە ئازار دەچێژێ.

کەواتە، ئەگەر ئافەرین، یاخۆ لۆمەی لە پیاوێکی ژیر و هۆزان بیست، پیاوێ کە بە خۆڕایی قسەناکات -وەکوو مامۆستای زانا و دادوەر- چێژ یان ڕەنج و بەخۆداشکانەوەی زۆرتر دەبێ. بەڵام کە نەزانێ گوتی، تا لە قسەکەی تەواو دڵنیا نەبێ نە چێژی لێ دەبا و نەپێی ئازار دەبینێ.

**هۆی دووەم**: پەسن و سەنا پیشان دەدا کە دڵی بێژەر بۆتە مولک و داگیرکراوی پەسنکراو. شان‌وشکۆ لە لای مرۆ خۆشەویستە؛ کەواتە گەر دەولەمەند و خاوەن شکۆیەک ئەم پەسنەکا، چێژی زۆرترە، چونکە دەسەڵاتداری بەسەر دڵی ئەو کەسەدا مەزنترە. بەڵام گەر هیچ نەدارێ، کەس نەناسێ، بەلەنگازێ ئەم پەسنەکا، چێژی کەمەو وەک ئەو نابێ.

**هۆی سێهەم**: پەسنی ئەو کەسە مزگێنی ئەوەی دەداتێ کە دڵی خەڵکی‌تریشی بۆ کەوی دەکا، چونکە کاتێ لە لای خەڵک پێیدا هەڵدەڵێ، خەڵک و خواش بیری چاکی لەسەر دەکەنەوەو ناوی چاکەی بڵاوە دەکا.

کەواتە گەر پەسن‌کردن لە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا بێ و لە پیاوێکی دەم ڕاست بێ، چێژی زۆرترە. لۆمە و پلاریش بە ئاوەژووی ئەمەیە.

**هۆی چوارم**: پەسن‌کردن بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە پەسنکەر -هەرچەند بە زۆر- بەڵام سەری لە ئاست گەورەیی ئەودا نەوی کردووە. گەورەییش لە لای خەڵکی خۆشەویستە، هەرچەند بە زۆریش بێ؛ چونکە هەرچەند دەزانێ ئەوەی دەیڵێ لە ناخی دڵەوە نییە و هیچ باوەڕێکی پێ نییە، بەڵام کە دەبینێ ئەو کەسە بۆ پێکهێنانی نیازی ناچارە پەسنی کات، چێژی لێ دەبا و حەزی پێ دەکا.

بەڵام ئەگەر لە پەسندا بە شتێکی بچوێنێ کە بزانێ درۆیە و کەس دانی‌پێدا نەنێ و لە دڵەوە نەیڵێ و بە هۆی ترسیشەوە نەیڵێ، بێ‌شک قەشمەری پێ‌کردووە و هیچ چێژی نییە؛ چونکە هەموو ئەو هۆوانەی لابردووە. ئێستا کە لە هۆکانی گەیشتی، دەرمانیشی ئاسانەو ئەگەر هان بدەی و کۆشەوە کەی، دەتوانی خۆتی لێ دەربازکەی.

یەکەم، بە هۆی پەیڤی ئەو کەسەوە ئارخەیان‌بوون لە تەواوتربوونی خۆ: دەبێ رامێنی و بیری لێ کەیتەوە کە ئەگەر ئەو تایبەتمەندییەی کە دەیڵێن -وەکوو زانست و پارێزگاری- راستە، دەبێ بەو زانستە و بەو پاریزگارییە شاد و شوکر بی و سپاسی ئەو خودایە بکەی کە ئەوانەی پێ خەڵات کردووی، نەک بە قسەی ئەو کەسە شادبیتەوە؛ چونکە بە قسەی کەس ئەوانەت کەم و زۆر نابن.

ئەگەر پەسنی دەوڵەمەندی و شان‌وشکۆتیان کرد، ئەوە خۆی هیچ ناکا، گەر بایەخێکی هەبێ و پێی شاد بی، دەبێ بەو کەسەوە شاد بی کە ئەم چاکەی دەگەڵ کردووی نەک تاریف و پێداهەڵگوتنی خەڵکی. تەنانەت زاناش هەرچەند لە زانست و پارێزگاری خۆی دڵنیابێ، نابێ پێی‌خەرەبێ و کەیفی پێوە بکا، چونکە ئەنجامی هیچ دیارنییە و تا دوایی کار خویان نەبێ، هەموو ئەوانە بێ‌بایەخن.

ئەوەی کە دوایین مەنزڵگای دۆژەەبێ، چجای شادوشوکور بوونیە؟ بەڵام گەر بزانێ ئەو دانستانە کە پێیداهەڵیانگوت -زانست و پارێزکاری- لەودا نییە، پێی شاد بوونەوە لە گەوجی و نەفامییە. ئەمە وەکی ئەوەیە کەسێک بڵێ ئەم بەرێزە گەلێک هێژایەو ناوزک و گەدەی پڕ لە عەتر و بۆن و بەرامەی خۆشە و بۆ خۆیشی چاک بزانێ کە وانییە و گەدە پڕ لە پیساییە و کەچی بەو پەیڤەش شاد بێتەوە؛ ئەم شادبوونە لە گەوجییە.

بەڵام هۆکانی‌تر، ئەنجامی ئەوە خۆش‌ویستنی شان‌وشکۆ و گەورەییەو دەرمانیشی هاتە گوتن.

بەڵام گەر کەسێک لۆمەی بکا، زیزبوون و توورەبوون هۆی نەزانییە. چونکە گەر ئەو کەسە راست دەڵێ، فریشتەیە. گەر درۆ دەکاو بۆ خۆی دەزانێ درۆ دەکا، شەیتانەو گەر نازانێ و درۆ دەکا، نەفام و بێ ئاوەزە؛ جا ئەگەر پەروەردگار کەسێکی کردە فریشتە، شەیتان یان نەفام، تۆ بۆچی دەبێ زیز و زویر بی؟ ئەگەر راستی گوت، دەبێ لەو کەمایەسیە کە لە خۆتدایە زویر بی، گەر کەمایەسییەکەت دینییە، بە پەیڤ و قسەی ئەو نییە؛ گەریش دونیاییە، خۆ ئەوە لە لای دینداران هونەرە نەک کەمایەسی.

دەبێ رامێنی و تێفکری و بزانی ئەوەی ئەو گوتی لەم سێ دۆخە بە دەرنییە:

گەر راستی گوت و بە دڵپاکیەوە گوتی، دەبێ شوکرانەبژێری بی. خۆ ئەگەر کەسێک پێت بڵێ لە جلکتدا مارێک هەیە و لێی دوور بگرە، سپاسی دەکەی. کەمایەسی کە لە دیندا بوو، لە مار پڕمەترسیترە، چونکە دوارۆژت دەفەوتێنێ. یاخۆ گەر برۆیتە لای پادشایەک، یەکێک پێت بڵێ: «جلک پیس! دانیشەو جلکەکەت خاوێن کەوە»، بە خۆتدا ورد دەبیتەوە بزانی راستە یان نە، کە راست بوو، سپاسی دەکەی و بەرگەکەت خاوێن دەکەیتەوە؛ چونکە گەر بەو پیساییەوە برویتە لای خونکار بێ‌شک سزات دەدا. کەواتە دەبێ شوکرانەبژێری بی کە لەو مەترسییەی رزگار کردی.

گەر بەمەبەستی تیزتێگرتن و تانەلێدان گوتی، تۆش قازانجی خۆتت دەس کەوتووە. تیزی ئەو خیانەتێک بوو بە دینی خۆی. کەواتە کە تۆ قازانجت بەرکەوتو ئەویش زیان، تووڕە بوونی شیاو نییە.

بەلام ئەگەر درۆی گوت، دەبێ رابمێنی و بزانی گەر لەم کەمایەسییە پاکژی، کەمو کووڕی‌ترت هەیە کە ئەو نەیزانیوە؛ دەبێ سپاسی پەروەرندەت کەی کە کەموکووڕیەکانتی لە خەلک شاردەوە و ئەم کابرایەش چاکەکانی خۆی بە دیاری پێ دای.

ئەگەر بە درۆ پەسنی بکردای، وەکوو ئەوە بوو کە تۆی کوشتبێ، دەسا چلۆن بە کوشتنت شادوشوکر دەبی و بە خەلاتێک کە پێی داوی زیز و زویر؟ کەسێک وا دەکا کە لە روالەتی کارەکان گەیشتبێ، نەک واتا و گیان و راستەقینەیان. تخووبی ژیر و نەفام هەر ئەمەیە کە یەکیان لە راستەقینەی کارەکان دەگاو یەکیان لە روالەت بەولاوە چیدی فام ناکا.

بە کورتی، تا پاپای سەرنجی خەلک لە خۆ دوور نەکا، ئەم دەردەی لە کۆل ناکەوێ.

## شرۆڤەی جیاوازی ئاستی خەلکی لە پەسن و رەخنەدا

خەلکی کاتی بیستنی پەسن و لۆمەی خۆیان دەبنە چوار دەستە:

**یەکەم،** زۆربەی خەلکی لەم دەستەدان، بە ژنەفتنی پەسنی خۆیان شادوشوکر دەبن و بە بیستنی لۆمە و سەرزەنشیان زیز و تووڕە دەبن و قەرەوی دەکەنەوە. ئەمە خراپترین و نزمترین ئاستە.

**دووەم،** ئاستی مرۆڤی پارسایە کە پەسن نەختێ شاد دەبن و بە رەخنە نەختێ تووڕە دەبن، بەلام نایدرکێنن. لە روالەتدا هەردووی لە لایان چوون یەکە، بەلام لە دلدا حەزیان لە پێداهەلگوتنە و رقیان لە رەخنەیە.

**سێهەم،** ئاستی پارێزکارانە، کە هەم پەسن و هەم لۆمەیان لە لاو وەک یەکەو بە یەکیان شاد و بەویتر تووڕە نابن. دلی ئەم کەسانە نە بە پێداهەلگوتن، دەگەشێتەوە، نە بە لۆمە و رەخنە کز دەبێ. هەم لە روالەت و هەمیش لە دەروونا بە یەک جۆر سەیری دەکەن و ئەم ئاستەش گەلێک بەرز و هێژایە.

هەندێ لە خواناسان لایان وایە گەیشتوونەتە ئەم ئاستە، کەچی هەلە دەکەن. دیاردەکەشی ئەوەیە کە ئەگەر ئەوەی لۆمەی دەکا لە لای دانشت، نابێ هاوقسەیی ئەو کەسەی پێ گران بێ و هاوقسەیی ئەو کەسەی تاریفی دەکا، پێی خۆشتر بێ؛ ئەگەر کەمتر سەردانی دەکا، دلی کەمتر لەو کەسەی پەسنی دەکا، تامازرۆی نەبێ؛ گەر لە کارێکدا بوون بە هاوڕێ، ئاریکاری ئەو کەسەی کە پێیدا هەلدەلێ لە هی ئەو کەسەی لۆمەی دەکا پێ خۆشتر نەبێ؛ ئەگەر مرد، خەمی مردنی ئەم کەمتر لە هی کەسی-تر نەبێ؛ گەر کەسێک ئازارێکی بەو کەسەی لۆمەی کردووە گەیاند، بەو رادەی کە ئازار بە پەسنکەر بگەینن دەبێ زیز بێ؛ ئەگەر سەنابێژ هەلەیەکی کرد، لە دلیدا سووکتر نەبێ. ئەمەش گەلێک دژوارە.

رەنگە پارێزگار خۆی بخاپێنێو بلێ بەم لۆمە کە کردی، خۆی تووشیاری گوناح کرد. ئەمە فێلو گزی شەیتانە؛ چونکە هەر لەو کاتەدا زۆر کەس هەیە کە گوناحی گەورە دەکەنو لۆمەی خەلکی‌تریش

دەکەن، بۆچی لە دەروونی خۆیدا لێی تووڕە نابێ؟ هۆی ئەو توورەییە نەفسە، نەک دینداری.

عابدێ کە لەم خاڵە وردانە بێئاگابێ، هەموو رەنجی خۆی بە خەسار داوە.

**چوارم**، ئاستی پاکانە، کە پەسنکەر بە نەیار دەزانێ و رەخنەگر بە دۆست؛ چونکە سێ بەهرەیان پێ دەگەینێ: یەکەم، نوقسانی خۆیانی پێ دەبینن؛ دووەم لۆمەبێژ چاکەکانی خۆی بە دیاری پێیان دەدا؛ دنەیان دەدا کە پتر لە دووی چاکە و پاکە بن و لە هەرچی گوناح و هێڵی لارە دوور بگرن.

لە خەبەردا لە پێغەمبەریان گێراوەتەوە کە: «هاوار لە رۆژووگرو لەوەی شەونخوونی دەکێشێ و نوێژی شەو دەخوێنێ و کەڵپۆس دەبەر دەکا، مەگەر ئەوانەی لە دەروونیاندا رقیان لە تاریف و پێداهەڵگوتن بێ و حەزیان لە لۆمە و سەرزەنش بێ».

گەر ئەم حەدیسە راست بێ، کارێکی زۆر دژوارە. چونکە گەیشتن بەم ئاستە گەلێک ئەستەم و پڕ تەگەرەیە، تەنانەت گەیشتن بە ئاستی دووهەمیش -کە لە روالەتدا وێکدەچن و لە دلدا لێک جیاوازن- دژوارە.

کەس ناگاتە ئەم ئاستە مەگین ئەو کەسەی ئەوەندە دەگەڵ نەفسی خۆی دوژمنایەتی کردبێ کە بووبێتە نەیاری نەفسی خۆی.

کە کەسێک باسی خراپەی نەفسی خۆی بیست، پێی شاد و شوکر بێ و ژیری و لێزانی ئەو کەسە بسەلمێنێ؛ هەروەک چۆن کەسێک باسی خراپەی دوژمنی بۆ بگێڕنەوەو پێی شاد بێتەوە. ئەمەش زۆر دەگمەنە. گەر کەسێک هەموو تەمەنی خەریکی کۆشەوە بێ و هان بدا تا پەسنبێژ و لۆمەبێژ لە لای دڵی وەکوو یەک بن، بە ئەستەم بەو ئاستە بگا.

دەبێ بزانێ هۆی ئەم مەترسی ئەوەیە کە جیاوازی نێوان پەسن و لۆمە خویان بوو، دڵ پاپای پەسنی بە سەردا زاڵ دەبێ و هان دەدا تا بە گزی و فێڵ پەسنبێژ لە دەوری خۆی کۆ کاتەوە. تەنانەت رەنگە بە دوڕوویی نوێژ کاو بەندەگی بەجێبێنێ و گەر بە گوناح بەو داخوازەی بگا، خۆی لێ نەبوێرێ. ئەمەی کە پێغەمبەر فەرموویە: «هەوار لە رۆژووگرو لە نوێژخوێن» لەم سۆنگەوە گوتوویە کە ئەگەر بناوانی ئەم داخوازە تێک نەدا، زۆر ناخایەنێ تووشی گوناح بێ.

بەلام بە دزێوزانینی لۆمە و حەز بە پەسن، لە خۆیدا هیچ گوناح نییە، بەو مەرجەی تووشی خراپە و گوناحی نەکا. زۆر دوورە کە تووش نەبێ. هۆی زۆربەی گوناحەکانی مەردم، پەسن و لۆمەیە. بیری خەڵکی گیرۆدەی ئەم داڵغەیە کە چ بکەن خەڵکیتریان لێ رەزابێ و لە چاو خەڵکی جوان بن. کە ئەم بیرەی بە سەردا زاڵ بوو، دەس لە کارگەلێ وەردەدا کە نەشیاو و نالەبارن؛ ئەگینا دڵی خەڵکی راگرتن و سەرنج پێ دانی - گەر بە ڕیا نەبێ - ناڕەوا نییە.

## بنەمای هەشتەم - دەرمانی دوڕازی بە عیبادەت و پەرستن

بزانە دوڕوویی لە عیبادەتی پەروەردگاردا لە ریزی گوناحە گەورەکانە و لە ئامبازدانان بۆ پەروەردگار نزیک دەبێتەوە. هیچ نەخۆشییەک پتر لەمە بەسەر دڵی پارسایاندا زاڵ نییە، کاتێ عیبادەتێ دەکەن پێیان خۆش بێ خەڵکوخوا بیزانن و ببینن و باوەڕیان بە پارێزگاریان بێ. کە مەبەست لە بەندەگی و پەرستن راکێشانی سەرنجی خەڵک بێ، ئەوە پەرستنی خودا نییە، بەڵکوو پەرستنی خەڵکەو هاوبەش‌دانان بۆ خودایەو کەسێکی‌ترکردنە ئامبازی خودایە لە پەرستندا.

پەروەردگار فەرمووی: فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا[1]؛ واتە: هەرکەس بۆ دیداری پەروەرندەی بە تاسەیە، بلێ بێجگە لە خودا کەسی دی مەپەرستن.

پەروەردگار دەڵێ: فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ، ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ، ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ، وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ[2]؛ هاوار لەو کەسانەی نوێژ بە هەڵەو پەڵە و رووبینی دەخوێنن.

یەکێک لە پێغەمبەر پرسی: «رزگاری لە چی دایە؟» فەرمووی: «لەوەدایە کە بەندەگی خوا بە جێ بێنی و لەبەرخاتری خەڵکی عیبادەت نەکەی». دیسان فەرمووی: «رۆژی پەسڵان کابرایەک دێنن و دەڵێن: "چ بەندەگییەکت هەیە؟" دەڵێ: "لە ریێ خوادا خەزام کردو گیانی خۆمم بۆی بەخت کرد". پەروەردگار دەڵێ: "درۆ دەکەی، بۆ ئەوەت کرد تا بڵێن فلان‌کەس پیاوێکی پیاوانەیە. بیبەن بۆ دۆژەە". کابرایەکی‌تر دێنن و لێی دەپرسن: "چ بەندەگییەکت هەیە؟" دەڵێ: "هەرچیم هەبوو لە ریێ خودا بە سەدەقەم دا". پەروەردگار دەڵێ: "درۆ دەکەی؛ بۆ ئەوەت کرد تا بڵێن فلان‌کەس جوامێر و

---

١ ـ قورئان،١٨/١١٠.

٢ ـ (قورئان، ١٠٧/٤-٧) هاوار بۆ ئەو نوێژکەرانەی، هۆش بە نوێژەکەیان نادەن. ئەوی دەستەی رووبینانن، دەبنە بەرگر لە بـاربوودان و زبارمش. (هـ).

دڵفراوانە. بیخەنە نێو دۆزەخەوە". یەکێکتر دێنن و لێی دەپرسن: "چ بەندەگییەکت هەیە؟" دەڵێ: "بۆ فێربوونی زانست و قورئان زۆرم هان دا تا بە خەڵکی فێرکەم". خوداش دەڵێ: "درۆ دەکەی؛ بۆیەت کرد تا بڵێن فڵانکەس پیاوێکی زانایە. بیگرن و لە دۆزەخی باوێژن"».

پێغەمبەر فەرمووی: «بۆ نەتەوەکەم لە هیچ شتێک بە قەدەر دانانی ئامبازی بچووک بۆ پەروەردگار ناترسم». گوتیان: «ئەوە چییە ئەی پێغەمبەر خودا!» فەرمووی: «مەرایی».

ڕۆژی پەسڵان پەروەردگار دەڵێ: «ئەی مەراییەکان! بڕۆنە لای ئەو کەسانەی لە بۆ خاتری ئەوان عیبادەتتان کرد و پاداشی خۆتانی لێ بستێنن».

پێغەمبەر فەرمووی: «لە ئەشکەفتی خەم هانا بەرنە بەر پەروەردگار». گوتیان: «ئەشکەفتی خەم چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟» فەرمووی: «شوێنێکە لە دۆزەخ، بۆ قورئان خوێنان و مەراییەکان چێ کراوە».

فەرمووی خوا دەڵێ: «هەرکەس منی پەرست و ئامبازی بۆ دانام، من لە ئامباز بێنیازم، هەمووی دەدەمە ئەو کەسیتر».

پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم ئاکارێ کە تۆزکاڵێ مەرایی تێدا بێ، وەرناگرێ».

مەعاز بە کوڵ دەگریا، عومەر گوتی: «بۆچی دەگری؟» گوتی: «لە پێغەمبەرم ژنەفت کە فەرمووی: "تۆزکاڵێ مەرایی، هامبازدانان بۆ خودایە"».

پێغەمبەر فەرمووی: «ڕۆژی پەسڵان گاسی ڕووبین دەکەن و دەڵێن: هۆ مەرایی! هۆ خراپکار! هۆ ستەمکار! کردەوەکانت پووچەڵ بوونەوە، مزت بەتاڵ بۆوە، برۆ و پاداشی خۆت لەو کەسانە بستێنە کە لە بۆ خاتریان کارت کرد».

شەدداد کوڕی وەیس گوتی: «پێغەمبەرم دی کە ئەسرینی دادەڕشت. گوتم: "بۆچی دەگری؟" فەرمووی: "زۆر دەترسم نەتەوەکەم ئامباز بۆ خوا دابنن، نە ئەوەی کەسێکیتر بپەرستن، یا کڕنۆش بۆ مانگ و خۆر بەن، بەڵکوو بە ڕووبینی و مەرایی عیبادەت کەن"».

دیسان پێغەمبەر فەرمووی: «لەو ڕۆژەدا کە هیچ سێبەرێ نییە، بێجگە لە سای عەرش، تەنیا ئەوانە دەڕۆنە ژێر سای عەرش کە بە دەستی ڕاست چاکەیان کردبێ و دەستی چەپیان نەیزانیبێ».

دیسان گوتی: کاتێ بینایی چاوان زەوینی ئافراند، زەوی کەوتە لەرزە. کێوی ئافراند تا ڕایگرێ. فریشتەکان گوتیان: «پەروەردگار هیچ شتێ بەهازتر لە کێوت نەخولقاند». کەچی پەروەردگار ئاسنی ئافراند تا کێو دابڕێ. گوتیان «ئاسن بە هێزترە». خوداش ئاوری ئافراند تا ئاسن بتوێنێتەوە. ئاوی خولقاند تا ئاور دامرێنێ. بای خولقاند تا ئاو بگرسێنێ. ناکۆکی کەوتە نێو فریشتەکان، لە خوایان پرسی: «چ شتێ لە سەرلەبەری ئافرێندراوەکانت بەهێزترە؟» فەرمووی: «مرۆڤێ کە بە دەستی

راستی سەدەقە بداو دەستە چەپی پێی نەزانێ. هیچ ئافرێندراوێکم لەو بەخوستتر نییە».

مەعاز دەڵێ کە پێغەمبەر فەرموویە: «بینایی چاوان بەر لە ئافراندنی ئاسمانەکان حەوت فریشتەی خولقاند. پاشان ئاسمانەکانی ئافراندو هەر فریشتەی کردە بەرپرسی ئاسمانێک و دەرگەوانی ئاسمانێکی پێ ئەسپارد؛ وەکی فریشتەکانی زەوی کە کردەوەکانی خەڵک دەنووسن و پاسەوانیان پێ دەڵێن و لە بەیانیوە تا خەوتنان کردەوەی بەندەکانی خوا هەڵدەگرن و بەرەو ئاسمانی یەکەمی دەبەن. زۆر پەسنی بەندەگییەکەی دەکەن، چونکوو ئەوەندەی عیبادەت کردووە، رووی وەکی هەتاو دەدرەوشێ. کەچی ئەو فریشتەی پاسەوانی ئاسمانی دونیایە دەڵێ: "ئەم پەرستنەی بگێڕنەوەو بە سەریدا بدەنەوە. من نگابانی خوسپەکەرانم، پەروەرندەم پێی گوتووم هەرکی خوسپەی کرد مەهێڵا عیبادەتی لێرە رابووڕێ". کردەوەیەکی‌تر کە خوسپەی تێدا نەبێ دەیبەن تا دەگاتە ئاسمانی دووەم. قاپیەوانی ئاسمانی دووە دەڵێ: "بە سەریدا بدەنەوە چونکە خودا پێێ گوتووم هەرکەس بۆ دونیا عیبادەتی کردبێ و لە کۆڕو کۆبوونەوەدا بەسەر خەڵکدا فیزی کردبێ، نابێ لێرە رابووڕێ". پاشان کردەوەیەکی‌تر کە تێیدا سەدەقەو رۆژوو و نوێژ هەبێ هەڵدەگرن و فریشتەکان لە رووناکی ئەو کردەوانە سەریان سووڕماوە. دەگەنە ئاسمانی سێیەم. دەرگەوانی ئاسمانی سێهەم دەڵێ: "من پاسەوانی خۆبەزلزانیم و ناهێڵم کردەوەی خۆبەزل‌زانان لێرە تێپەڕێ و ئەمەش بەسەر خەڵکدا خۆی‌بەزل زانیوە". بۆیە کردەوەیەکی‌تر دەبەن تا دەگەنە ئاسمانی چوارم. ئەو فریشتەش دەڵێ: "من نگابانی لە خۆبایی بووانم. کردەوەکانی لە خۆبایی بووان پەتی نین، نایەڵم تێپەڕێ". بۆیە کردەوەیەکی‌تر هەڵدەگرن و بەرەو ئاسمانی پێنجم دەکەونە رێ. ئەم کردەوە لە جوانیدا وەکی بووکی یەک شەوە جوان و رازاوەیە، فریشتەی ئاسمانی پێنجم دەڵێ: "ئەم کردەیە بدەنەوە بەسەر خۆیدا، من پاسەوانی رژدی و چنۆکیم، هەرکەس لە زانست و کردەوەدا گەیشتۆتە ئاستی ئەو، بەخیلی پێ بردووە". کردەوەیەکی‌تر دەبەن تا دەگەنە ئاسمانی شەشم. ئەم فریشتەش دەڵێ: "ئەم کردەوەیە بگێڕنەوە، چونکی هەرکەس ئازارێکی پێگەیاندبێ، بەزەیی پێدا نەهاتۆتەوە هیچ، بە خەم و کەسەری شادوشوکر بووە. من فریشتەی بەزەییم، ناهێڵم ئەم کردەوەیە بە سەرمندا تێپەڕێ". کردەوەیەکی‌تر هەڵدەگرن کە وەکی هەتاو رووناکە و وەکی تریشقەی هەور لە هەموو ئاسمانەکان دەنگ دەداتەوەو هیچ فریشتەیەک ناتوانێ ببێتە بەربەستی تا دەگاتە ئاسمانی حەوتم. کەچی فریشتەی ئاسمانی حەوتم دەڵێ: "ئەم کردەوەیە بە سەریدا بدەنەوە، چونکە مەبەستی پەروەردگار نەبووە، بەڵکوو مەبەستی شان‌وشکۆی لای زانایان و ناوودەنگی ناوشاران بووە. هەرچی وابێ، مەراییە و پەروەردگار بە هیچ نایەوێ". کردەیەکی‌تر هەڵدەگرن و لە ئاسمانی حەوتم تێدەپەڕن. ئەو کردەیە بە ئاکاری جوان، یاد و بیر و ویری خودا و پەرستنی‌تر خەملاوەتەوە و سەر لەبەری فریشتەکان

دەگەڵی دەڕۆنە پەرای پەروەردگار و هەموویان دانی پێدا دەنێن کە بێخەوش و پاک و پاراوە. پەروەردگار دەڵێ: "ئەنگۆ پاسەوانی زانست و کردەوەکانین و منیش چاودێری دڵیم. ئەم کردەیە بۆ من نەبووەو لە دڵدا مەبەستی‌تری بووە. بە لەحنەتی من بێ!". فریشتەکان پێکڕا دەڵێن: "لەحنەتی تۆ و هەمووی ئێمەی لێ بێ!" ئاسمانەکان و هەرچی لە ئاسمانایە دەڵێن: "لەحنەتی ئێمەشی لە سەربێ!"».

**ئاسار**

عومەر پیاوێکی بینی گەردنی کەچ کردووەو سەری سڕی داخستووە، واتە من پارسام. گوتی: «هۆ خودانی گەردنی کەچ! سەرت بەرزکەوە، پارێزگاری لە دڵایە نەک مل».

ئەبووئێمامە یەکێکی بینی لە مزگەفتدا کە رۆندکی لە چاو دادەباران. گوتی: «کێ وەک تۆ دەبوو گەر ئەوەی لێرە دەیکەی، لە ماڵدا بتکردایە؟».

عەلی دەڵێ: «مەرایی سێ دیاردەی هەیە: کە تەنیا بێ زۆر سستە؛ کە خەڵکی دی دەگەشێتەوە؛ کە پەسنی کەن، کردەکانی فرە دەکاتەوە؛ کە لۆمەی کەن کەمتری دەکاتەوە».

کابرایەک لە سەعیدی موسەییبی پرسی: «رات چییە لەسەر ئەو کەسەی ماڵوسامانێ بدا بۆ رەزای خودا و پەسنی خەڵکی؟» گوتی: «دەیەوێ خوا ببێتە دوژمنی؟» گوتی: «نە». گوتی: «کەواتە چۆن کارێک دەکا بۆ کەسی‌تر، کە نابێ بێجگە لە خوا بۆ کەسی کا؟»

عومەر قەمچییەکی دا لە کەسێک. گوتی: «وەرە تۆڵەم لێ بستێنەو لێم بدەرەوە». گوتی: «بۆ تۆ و بۆ خودا دەتبوورم» گوتی: «بە کەڵک نایە. یا لەبەر خۆم بمبەخشە، یان پەروەردگار؛ بێ ئامباز دانان». گوتی: «بە بۆنەی خوداوە لێت دەبوورم؛ بە بێ هامباز».

فوزەیلی عەییاز دەڵێ: «سەردەمێ بەو شتانەی کە دەیانکرد، خەریکی مەرایی‌بوون، هەنووکە بەو کارانەی کە نایکەن رووبینی دەکەن».

قەتادە دەڵێ کاتێ بەندە مەرایی دەکا خودا بە فریشتەکانی دەڵێت: «سەیرکەن چۆن قەشمەریم پێ دەکا!»

**شرۆڤەی ئەو کارانەی رووبینی پێ دەکرێ**

بزانە، راستەقینەی مەرایی ئەوەیە کە مرۆڤ بە نیازە خۆی لە لای مەردم بە پارێزگار بنوێنێ، تا خۆی لە لایان پیاوچاک پیشان بدا و بڕواتە دڵیانەوە، تاکوو رێزی لێ بنێن و لە لای ژوورووی دابنێن و کڕنۆشی لەبەربەن و بە هێژایی سەیری کەن. ئەوەش وا دەکرێ کە ئەوشتەی هۆی پارسایی و

پارێزکارییە و لە لای خەڵکی بەرز و هێژایە و دیاردەی دینداریيە، پییان دەنوێنێ. ئەمەش پێنج جۆرە:

**یەکەم،** ڕواڵەتی لەشە: بەو چەشنەی کە ڕووی زەرد هەڵگەڕێنێ تا پێیان وابێ شەو نەنوستووە؛ خوست لە خۆی ببڕێ تا پییان وابێ کۆشەوەیەکی گەورە دەکا؛ خۆی لێو بە بار پیشان بدا تا وا بزانن خەمی دین وای لێ کردووە؛ پرچی شانە نەکا، تا بڵێن ناکەوێتە بیری خۆی و ناپەرژێتە سەر خۆی؛ بە ئەسپایی بپەیڤێ و دەنگ هەڵنەبڕێ تا پییان وابێ ئەوە گەورەیی دینە لە دڵیدا؛ لێوی وشک کا، تا بڵێن ڕۆژووە. چونکە لەم کارانەدا خەڵکی وا بیر دەکەنەوە کە ئەمە پیاوی خوایە و پارێزکارە و نەفسیش چێژو حەزی زۆری لێ دەبا.

لەم سۆنگەوە عیسا گوتی: «کە کەسێکتان ڕۆژوو دەگرێ دەبێ پرچی دابێنێ و لێوی چەور کاو چاوی بڕێژێ، تا کەس نەزانێ بە ڕۆژووە».

**دووەم،** ڕووبینیە بە جل‌وبەرگ: بەو جۆرەی کە کەڵپۆس دەبەرکاو بەرگی زبر و کورت و پیس و پەڕپووت بکاتە بەر تا بە پارسای بزانن. یان بەرگی شین و بەرماڵی پینەکراوی سۆفییەکان هەڵبگرێ تا بە سۆفی بزانن؛ کەچی هیچ لە سۆفی نازانێ. یان فۆتە بداتە سەر سەروێنەکەیدا و شەکالی چەرم دەپێ کا تا پییان وابێ لە تارەتدا زۆر وردەکارە و واش نەبێ. یاخۆ عابا بخاتە سەرشانی تا وابزانن زانایە و زاناش نەبێ.

ئەوانەی مەرایی بە بەرگ دەکەن، دوو دەستەن: تاقمێ دەیانەوێ خەڵکی ڕەمەکی دانیان پێدا بێنن، بۆیە بەرگی کۆنەو دڕاو و پەڕپووت دەبەر دەکەن. گەر کەسێک داوایان لێ بکا کە بەرگی تووزی[1] یان خەز یاخۆ بەرگێکی ڕەوا بکەنە بەر، لە گیان‌کەنشت بۆیان سەختترە، چونکە خەڵک پێی دەڵێن لە پارێزکاری پاشگەز بۆتەوە.

تاقمێکیش بە نیازن لە لای خەڵکی ڕەمەکی و خونکاران و ئافرەتان پەسند بکرێن. گەر جلکی پەڕپووت دەبەرکەن، سوڵتانان بە سووکی سەیریان دەکەن، گەر بەرگی ڕازاوەش بکەنەبەر خەڵکی ڕەمەکی سووک سەیریان دەکەن. کەواتە هان دەدەن تا فۆتەی بە نەخش و نیگار بکەنە بەر، هەر لە لەونی بەرگی پیاوچاکان، تا خەڵک سەیریان کەن. بایی بەرگەکەیان بە قەدەر بایی بەرگی دەوڵەمەندانە تا سوڵتانان بە سووکی سەیریان نەکەن. گەر بە یەکێک لەم تاقمە بڵێی بەرگی تووزی یا خەز دەبەر کە -هەرچەند نرخی کەمتر لەو فۆتە بێ- لە گیان کەنشت بۆیان دژوارترە. بە کورتی هەر بەرگێک کە خەڵک پییان وابێ کە لە پارێزگاری پاشگەز بۆتەوە، نایکەنە بەریان.

ئەو گێلە پیاوە، بەرگێک کە ڕەوایە و دینداران دەیکەنە بەر، ئەم لەبەر خواستنی خەڵک نایکاتەبەر؛

---

[1] ـ تووزی: قوماشێکی زۆر ناسک کە سەرەتا لە شارێکدا بە ناوی تووز چێ کراوە.

نازانێ کە بەم کارەی خەڵک دەپەرستێ نەک خوای خەڵک. ڕەنگە بیشزانێ و هیچ خەمی نەبێ.

**سێهەم،** مەرایی بە ئاخاوتنە: وەکوو ئەوەی لێو دەلەرنێتەو تا خەڵک لایان وابێ لە زیکر و یادی خودا هەدا نادا. ڕەنگە زیکر کا، بەلام پێی نەکری بە دڵ زیکر کاو لێو بزوێنێ، چونکە دەترسێ خەڵک نەزانن کە زیکر دەکا. لە لای خەڵکی فرە ئامۆژگاری دەکا، کەچی لە تەنیایی خۆیدا بە پێی ئەو مۆچیارییە نابزوێتەوە. یان زاراوەو پەیڤی سۆفییەکان فێر دەبێ و دەیلێتەوە تا خەڵک وابزانن زانستی تەسەوف چاک دەزانێ؛ یاخۆ ناوەبەناوە سەری دادەخاو دەیلەرزێنێتەوە تا بڵێن خەریکی حاڵە؛ یان هەناسەی سارد هەڵدەکێشێ تا خەڵک پێیان وابێ خەمباری نەزانی خەڵک و ناموسوڵمانییە؛ یاخۆ ئەخبار و چیرۆکی پیاوچاکان فێر دەبێ و دەیانلێتەوە تا بڵێن زانستی زۆرە و پیری زۆری دیوەو زۆر گەڕاوە.

**چوارەم،** مەرایی بە عیبادەت: وەکوو ئەوەی کە کاتێ کەسێک لە دوورەوە هات بەدەوتر نوێژ کاو سەری داخاو لە ڕکووع و سوجدەدا زۆرتر بمێنێتەوەو سەیری دەوروپشت نەکا؛ یان لە لای خەڵکی خێری زۆرتر بداتە هەژاران؛ لە ڕۆیشتندا بەکاوەخۆ بڕوا و سەری داخا، کەچی گەر تەنیا بێ بلەز بڕوا و سەیری دەوروپشتی کا، بەلام کە کەسێکی لە دوورەوە بینی هێواش بڕوا و سەری داخا.

**پێنجەم،** وا پیشان بدا کە مورید و شاگردی زۆرەو خواجەو میرو دەسەلاتداران دێنە سەردانی و لە ودمی بەهرە دەبەن و مەشایەخ ڕێزی زۆری لێ دەنن. ڕەنگە ئەم واتایانەی بە زماندا بێ؛ یان دەگەڵ کەسێک ناکۆکێ کەوێتە نێوانیان و بڵێ: تۆ کیت، موریدت کێیە، پیرت کێ بووە؟ من چەنای چەن پیرم دیوە و چەنای چەن ساڵ پەرای فلان پیرم کردووە، تۆ کام پیرت بینیوە و پەرای کێت کردووە؟ و شتی وا. بەم چەشنە وا بنوێنێ کە ڕەنج و ئازاری زۆری چەشتووە.

چێژی ڕووبینی و مەرایی هەموو ئەم ئازارانە ئاسان دەکا؛ چونکە زاهید هەیە کە بە یەک دانە نۆک چێشتی لێناوەو بە هیوای ئەمە کە خەڵک پێی دەزانن، چێژی لێ بردووە. سەرلەبەری ئەمانەی بێژران، حەرام و نارەوان، کە بۆ پەرستن و بەندەگی خودا بێ و کە بۆ خۆ پارێزگار نواندن بێ، چونکە پارێزگاری دەبێ بۆ خودا بێ نەک بەندە.

بەلام گەر کەسێک بیهەوێ شانوشکۆیەک بەدەس بێنێ، بە کارێک بێجگە پەرستنی خودا، ڕەوایە. هەرکەس لە خانووی ڕۆیشتەدەر و جلکێکی جوانی دەبەرکرد، ڕەوایە، تەنانەت سوننەتە؛ چونکە بەم چەشنە جوانی و مێرخاسی خۆی پیشان داوە، نەک پارێزکاری. هەروەها گەر کەسێک هێژایی و لێزانی خۆی بە زانستێک بێجگە زانستی دین -وەکوو زانستی زمانەوانی، وشەوانی، ژمێریاری، پزیشکی و شتیوا- هەڵخست و خۆی خستە بەرچاو، هەرچەن مەراییە بەلام ڕەوایە؛ چونکە بۆ بەدەستهێنانی پلە و پاگەیە. هەروەها گوتمان کە دانەپەی شانوشکۆ، گەر لە تخووبی

خۆی تێنەپەڕێ و بە بەندەگی و پەرستنی خوداش نەبێ، ڕەوایە.

ڕۆژێک پێغەمبەر ویستی لە خانووی بێتەدەر، تاقمێ لە یارانی ڕاوەستابوون. سەیری سەوەی ئاوی کرد و پرچی تەکووز کرد. عایشە گوتی: «ئەی پەیغەمبەری خودا! پرچت جوان دەکەی؟» فەرمووی: «ئەرێ، پەروەرندەم پێی خۆشە کاتێ بەندەیەکی بۆ دیتنی برادەرانی دەڕوا خۆی بڕازێنێ و جوان بێ». ئەم کارەی پێغەمبەر بۆ خاتری دین بوو؛ چونکە دەبوایە جێی خۆی لە نێو چاو و دڵی خەڵکیدا بکاتەوە تا پێڕەوی لێ بکەن و گوێی بۆ ڕادێرن؛ بەڵام گەر کەسێک بۆ جوانی و خەملاندن ئەم کارەکا، دیسان ڕەوایە، چونکە سوننەتە.

یەکێک لە قازانجەکانی خۆخەملاتن ئەوەیە کە کەسێک ئاڵۆزو شپرێو و ژاکاو بێ و جوامێری ڕانەگرێ، خەڵکوخوا لیێ دوور دەبنەوەو بێزیان لێ دێ. ئەمیش خۆی هۆی ئەو سووچەیە.

بەڵام چاوە گەر بە عیبادەت بێ، حەرامە؛ ئەویش بە دوو هۆ:

**یەکەم** ئەوەی کە خەریکی خاپاندنی خەڵکی بووەو وای پیشان داوە کە مرۆڤێکی پاک و بێخەوشە لە پەرستندا. کەچی چونکە دڵی ها بە لای خەڵکەوە، بێخەوش نییە. ئەگەر خەڵک بزانن بۆ ئەوان وا دەکا نەک لە بۆ خوا، بە دوژمنی دەزانن و دانی پێدا نانن.

**دووەم** ئەوەیە کە نوێژ و ڕۆژوو و عیبادەتێ کە دانستەی پەروەردگارە، بۆ کەسێکیتری بەجێهێنابێ، وەکی ئەوەیە گاڵتەی کردبێ و بەندەی بێهێز و بێچارە و بێخوستی لە کارێکدا کردۆتە ئامباز، کە تایبەتی پەروەردگارە. ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە لە هەمبەر پادشایەک ڕاوەستابێ و بڵێ بەندەگیت دەکەم، کەچی بە چاوی سەیری کارەکەر یان خولامێک دەکا و بە دەم دەڵێ مەبەستم لەم دەستەونەزەر ڕاوەستانە پادشایە و کەچی لە ڕاستیدا بۆ سەیرکردنی کارەکەرە.

ئەمە سووکایەتییە کە بە پەروەردگار دەکرێ، چونکە دەست و پێوەندەکانی بە گرینگتر زانیوە تا پادشا. هەروەها هەرکەس بە مەرایی نوێژ کا، ڕاستەکەی ئەوەیە کە ئەو کڕنۆش بردن و چەمانەوەیە بۆ کەسانیتر بووە نە پەروەردگار. ئەوەی مەبەستی لە کڕنۆشبردن کەسێکیتر بێ، بە ڕاشکاوی ئامبازی بۆ خوا داناوە؛ بەڵام ئەوەی مەبەستی خوا بێ و کەچی لە دڵدا پێی خۆش بێ سەرنجی کەسیتر ڕاکێشێ، بە شراوەیی ئامبازی بۆ خودا داناوەو تووشی ئامباز دانانی بەرپیوار بووە، نەک ئاشکرا.

## شرۆڤەی ئاستەکانی ڕووبینی

بزانە ئاستەکانی مەرایی جۆر بە جۆرن و هەندێ گەورەتر لە هەندێترن.

هۆی جیاوازییان سێ شتە:

**یەکەم**، بەبێ‌چاوەڕوانی پاداش، مەرایی دەکا، هەروەک نوێژ دەکاو ڕۆژوو دەگرێ و گەر تەنیابێ نایکا. ئەمەی کە چاوەنۆڕی پاداش ناکا، لە تووڕەیی پەروەردگاری دەرباز ناکا.

گەر هیوای پاداشی بەسەر دلدا زاڵ نەبوو و گەریش تەنیا بایە هەر نوێژی دەکرد و ڕۆژووی دەگرت، کەچی لە لای کەسانی‌ترەوە خێی زۆرتر دەداتە عیادەتەکەی و لە لای ئاسانترە، هیوادارم کە عیبادەتەکەی بەمە پووچەڵ نەبێتەوە و پاداشەکەی بە فیڕۆ نەڕوا. بەلام بەو رادەیە کە تووشی چاوە بووە، یان سزا دەدرێ یان لە پاداشی کەم دەبێتەوە.

ئەگەر هەردوو مەبەست -پاداش و مەرایی- لە دلدا وەکوو یەک بوون، واتە هیچیان بەسەر ئەویتردا زاڵ نەوو، ئەمە ئامباز دانانەو ئەوی لە ئەخبار دیارە وا دەلێت کە لە سزادان دەرچوونی بۆ نییە و تووش دەبێ.

**دووەم**، جیاوازی ئەو عیبادەتەی مەرایی تێیدا دەکەن . ئەوەش سێ ئاستە:

**ئاستی یەکەم**: مەرایی لە بناغەی ئیماندا. ئەمە بڕوای رووبینانە و گوناحی ئەمانە گەلێک گەورەتر لە هی کافرانە؛ چونکە ئەمانە لە دلدا کافرن و لە ڕوالەتدا خەلک دەخاپێنن. ئەمانە لە سەرەتای ئیسلامدا زۆربوون و ئێستا کەمترن.

بەلام ئەباحەتی و لە دین دەرچووان و ئەوانەی هیچ بڕوایان بە شەریعەت و ڕۆژی پەسلان نییە و کەچی بە ئاوەژووی ئەوە خۆ دەنوێنن، دەڕۆنە ریزی دوڕازان و بۆ هەتاهەتا لە دۆژەدەمێننەوە.

**ئاستی دووەم**: چاوە لە بنەمای عیبادەتدا. وەکوو ئەو کەسانەی لە لای خەلکی بەبێ دەسنوێژ نوێژ دەکەن یا لە لای خەلکی ڕۆژوو دەگرن و کە تەنیا بوون دەیکەنەوە. ئەمەش گەلێک گەورەیە، بەلام نە بە قەدەر مەرایی لە بنەمای باوەڕدا.

ئەم کەسە چونکە سەرنجی خەلکی لە هی پەروەردگار پێ‌خۆشترە، باوەڕی زۆر کز و لاوازە؛ هەرچەند کافر نییە، بەلام لە گیانەلادا گەر تۆبە نەکاو لە کردەی خۆی پاشگەز نەبێتەوە، ڕەنگە بە کافری بمرێ.

**ئاستی سێهەم**: لە بنەمای بڕوا و عیبادەتدا رووبینی نەکا، بەلکوو لە سوننەتدا تووشی مەرایی بێ؛ وەکوو خوێندنی نوێژی شەو، سەدەقەدان، نوێژی بە کۆمەڵ بە جێهێنان، ڕۆژانی عەرەفەو عاشوورا و دووشەمۆ و پێنج شەمۆ و ڕۆژانی پیرۆز ڕۆژووگرتن، بۆ ئەوەی لۆمەی نەکەن و پەسن و تاریفی کەن. ڕەنگە بلێ خۆ ئەمانە فەرز نین و وای بۆ دەچم کە نەمکردووەو چاوەنۆڕی هیچ پاداشێ ناکەم، بۆیە هیچ سزایەکیش نابێ بدرێم. بەلام چونکە عیبادەت تەنیا تایبەت بە پەروەردگارەو خەلک هیچ بەشیان تێدا نییە، کەچی گەر بۆ خاتری خەلکی خوێندرابێ، پەروەردگار خراوەتە پشت گوێ لەشتێکدا کە تایبەت بەخۆیە. ئەمە گالتەکردن بە پەروەردگارە و دەبێتە هۆی سزا و ئازار، هەرچەند

بە توندی رووبینی لە فەرزەکاندا نییە. یا تووشی مەراییەک بێ کە لە رووبینی لە سوننەتدا نزیک بێ؛ وەکوو ئەوەی کە کەسێکی دی، جوانتر نوێژ کا، هیچ سەرنجی دەور و پشتی نەدا، قورئان خوێندنی درێژە پێ بدا، تەنیا بە کۆمەڵ نوێژ کا، لەریزی بەرەوە جێ بگرێ، لە زەکاتدا ئەوەی بدا کە لە هەمووان چاتر بێ، لە رۆژوودا ئاگاداری زمانی بێ و لە تەنیاییدا دابنیشێ.

**سێهەم**، جیاوازی نێوان مەبەستی مەراییە؛ چونکە بێ گومان، مرۆڤی رووبین، لەم کارەی دۆزێکی هەیە و ئەوەش سێ جۆرە:

**جۆری یەکەم**: ئەوەی کە مەبەستی پلە و پاگەیەک بێ تا لەو سۆنگەوە خراپەیەک یان گوناحێک بکات؛ وەکوو ئەوەی خۆی بە مرۆڤێکی دەستپاک و پارێزگار و حەلاڵخۆر بنوێنێ تاکوو ببێتە بەرپرسی ئەوقاف و قەوینتی و ئەمانەت و ماڵوسامانی مندالانی سێوی و لەوانەدا خەیانەت کا؛ یاخۆ پارەی پێ بدەن کە بە زەکات و سەدەقە بیدا، یان بیداتە نەداران، یان لە رێی حەجدا بۆ نیازمەندانی خەرج کا، یاخۆ لە خانەگای سۆفییاندا خەرجی کا، یا خانوو، مزگەفت، رێگا و کاروانسەرای پێ بکاتەوە، یا لە کۆڕدا خۆ بە پیاوی خودا پیشان بدا و چاوی لە ژنێک بێ و بە تەمابێ دڵی ئەو ئافرەتە بفڕێنێ و دەگەڵی تێکەلاوی کا؛ یان بە تەمای سەیرکردنی ئافرەتێ یان لووسکەیەک بڕواتە کۆڕێ؛ ئەمانەو بابەتی وەکوو ئەمانە، گرانترین گوناحن کە کەسێک بۆ گەیشتن بە پاپای نەفسی خۆی، لە دین و عیبادەت بەهرە وەربگرێ.

هەروەها گەر کەسێک بوختانی خەیانەت لە ماڵ یا ژنێکی بۆ هەڵبەستێ، ئەمیش بۆ پاکانەی ئەو بوختانە ماڵوسامان بە سەدەقە بدا و لەو ئافرەتە خۆی دوور بگرێ، تاکوو بڵێن ئەمە کە وا سەدەقە دەدا، کەی چاوی لە سامانی خەڵکە؛ ئەمەش هەر مەرایی کردووەو گوناحبارە.

**جۆری دووەم**: ئەوەیە کە مەبەستی لە مەرایی بابەتێکی حەلاڵ بێ. وەکوو ئامۆژیارێ کە خۆی بە مرۆڤێکی پارێزکار بنوێنێ تا شتێکی پێ بدەن، یان ژنێکی بۆ مارەکەن، ئەمەش هەر دەکەوێتە بەر تووڕەیی خودا، هەرچەن وەکوو ئەوانەی پێشوو نییە. چونکە ئەمیش عیبادەتی کردۆتە ئامرازێ بۆ راوی دونیا، لە کاتێکدا پەرستن رێگایەکە بەرەو خودا و بۆ گەیشتن بە بینایی چاوان و بەختەوەری دوارۆژ. چونکە رێگای خودای بۆ راوی دونیا تەرخان کرد، خەیانەتێکی گەورەی کردووە.

**جۆری سێهەم**: ئەوەیە کە هیچی ناوێ، بەلام ترسی ئەوەی هەیە کە بە چاوی رێز و حورمەتەوە سەیری نەکەن، وەکوو ئەوەی سەیری پارێزکاران دەکەن. کاتێ پیاسە دەکا، کە کەسێکی لە دوورەوە بینی بە ئەسپایی و بەکاوەخۆ رێگا دەبڕێ و سەری دادەخاو رادەمێنێ و تێدەفکرێ، تاکوو بڵێن لە رێگاشدا خەریکی بیری دین و خودایەو لە ریزی نەزانان و بێئاگایان نییە. کە پێکەنینی بۆ بێ، سەری داخاو کەنینەکەی بخواتەوە تاکوو نەڵێن گاڵتەو کەنینی بە سەردا زاڵە؛ یان گاڵتە نەکا، تاکوو

نەڵێن گاڵتەچییە. یا هەناسەیەکی سارد هەڵکێشێ و خۆی خەمین پیشان بداو سوبحانەڵایەک بڵێت و بڵێ خەڵکی چەن بێ ئاگان، دەڵێی لە گوێی گادا خەوتوون، کە کاتێکدا ڕێگەمان بەرەو خوایە؛ کەچی خودا لە دڵی ئاگاداره و دەزانێ گەر تەنیا بێ قەد وا نالێ. یان کەسێک لە لای خوسپە کاو ئەم دەڵێ «کاری گرینگتر لەم خوسپەش هەیە و چاتر وایە بپەرژینە سەر باسی کەمایەسییەکانی خۆمان»، بۆ ئەوەی نەڵێن فلان‌کەس خوسپە دەکا. یا خۆ تاقمێ ببینێ کە خەریکی نوێژی تەراوێحن، یا شەونوێژ دەخوێنن، یان ڕۆژانی پێنج شەمۆ و دووشەمۆ ڕۆژوو دەگرن و گەر ئەم وا نەکا دەڵێن سست و کەم بڕوایە، بۆیە ئەمیش وا دەکا. یا لە عەرەفەو عاشووورادا گەر تینووی بێ، ئاو نەخواتەوە تا نەڵێن ڕۆژوو نییە؛ یاخۆ کەسێک پێی بڵێ خواردن بخۆ و ئەمیش بڵێ بەربەستێکم هەیە و ناتوانم، واتە ڕۆژووم و کەچی ڕۆژووش نییە؛ بەم شێوە دوو پیسایی پێکڕا کۆوە دەکا: یەکەم دووڕازی، چونکە خۆی بەرۆژووگر دەنوێنێ، دووەم وا خۆی دەنوێنێ کە ڕۆژووم و نامەوێ ئاشکرای کەم و دەیشارمەوە، بۆیە بەراشکاوی نالێم ڕۆژووم. دەیەوێ بەم جۆرە خۆی بە بڕواداریکی بێخەوش بنوێنێ. ڕەنگە لەبەر تینوێتی خۆی پێ نەگیرێ و ئاو بخواتەوەو بڕو بیانوو بێنێتەوەو بڵێ دوێشە و ناساغ بووم، ئەمڕۆ ڕۆژووم پێ نەگیرا؛ یان فلان‌کەس ڕۆژووەکەی پێ شکاندم؛ یان ڕەنگە هەر لەو کاتەدا هیچ نەڵێ و پاش ماوەیەک لە لایەکی‌ترەو بیانوویەک بێنێتەوەو وەکوو ئەوەی بڵێ دڵی دایکان زۆر ناسکەو پێیان وایە گەر منداڵیان ڕۆژوو بگرێ، دەمرێ (واتە لەبەردایکم ڕۆژووم نەگرتووە). یاخۆ دەڵێ پیاو کە بە ڕۆژوو بێ، شەو زوو خەوی لێ دەکەوێ و شەونوێژی پێ ناکرێ. ئەمانەو شتی وەک ئەمانە، شەیتان پێیان دەڵێ، کاتێ پیسایی مەرایی لە دڵیاندا بێ. قورعان‌خوێنی هەژار لەمەش بێ‌ئاگایە؛ چونکە نازانێ بنج و بناوانی خۆی تێک دەدا و عیبادەتەکانی دەفەوتێنێ.

زۆر سانایە کە هەندێ لە مەراییەکان لە ڕێگاچوونی مێرووولەیەک هێورتر و بێ‌دەنگترەو تەنانەت زانایان و هۆزانان تیێ ناگەن، چ بگا بە پارێزکارانی ساویلکە و نەزان.

### شرۆڤەکردنی مەراییەک کە لە ڕۆیشتنی مێروولە بێدەنگترە

هەندێ لە مەراییەکان ئاشکران، وەکی ئەوەی لە نێو کۆمەڵدا شەونوێژ دەکاو کاتێ تەنیایە، نەیخوێنێ؛ ئەمە رووبینی ئاشکرایە. شراوەتر لەمەش ئەوەیە کە هەرچەند لە تەنیایی خۆیدا شەو نوێژ دەکا، بەلام کاتێ کەسێکی لە لایە بەگوڕتر و ئازاتر نوێژ دەکاو نوێژ خوێندنی لا ئاسانە؛ ئەمەش هەر ئاشکرایە. وەکوو خوشیانی مێرووولە نییە، چونکە دەکرێ بناسرێ؛ لەمەش پیوارتر هەیە. وەکوو ئەوەی بە گوڕتر نەبێ و ئازارتر نەبێ و هەر وەکوو جاران نوێژ کاو هیچ گۆڕانێ لە ڕواڵەتیدا دیار نەبێ و لە ناخیدا وەکوو ئاور لە نێو ئاسندا بیشارێتەوە، بەلام ئاسەواری ئەمە کاتێ خویان دەبێ کە زانی

خەڵک بەم دانستەیە دەزانن، ئەودەم پێی شاد دەبێتەوە؛ ئەم شادبوونەوە بەڵگەی ئەوەیە کە لە ناخیدا رووبینی شراوەتەوە. گەر ئەم شادییە بە کرێت نەزانێ و چاری نەکا، رەنگە ئەم دەمارە بەرپیوارە خۆی ببزوێنێ و ئاشکرابێ و داوای ئاشکرابوون کا، یان گەر بەراشکاوی نەڵێ، کەچی بە تەوس و پلار و هێما و ئاماژە داوای ئاشکرابوونی لێ بکا. گەر بە هێما و ئاماژە خۆی نەنواند، رەنگە بە رواڵەت خۆی بنوێنێ؛ خۆی ماندوو پیشان بدا تا بڵێ شەونوێژم کردووەو نەخەوتووم. یاخۆ رەنگە لەمەش بەرپیوارتر بێ: وەکوو ئەوەی بوونی خەڵکی هیچ بەسەر نوێژ خوێندنیدا کاریگەر نەبێ و خێراتر نەبێ، کە لە شوێنێکی‌تریشدا زانی باسی ئەو دەکرێ، پێێ شاد نەبێ و لەمەراییش پاکژ نەبێ. بەڵام کاتێ کەسێک دەبینێ کە سەرەتا سلاو ناکا، زۆری پێ سەیرە. یان گەر کەسێک زۆری رێز نەگرێ، بەخێرایی کاروباری پێک نەهێنێ، لە کڕین و فرۆتندا دەگەڵی رێک نەیێ، لە کۆبوونەوەکاندا جێگای سەرتری بۆ تەرخان نەکرێ، لە دڵدا زۆر سەری سوور دەمێنێ؛ بە خۆی دەڵێ گەر ئەو عیبادەتەت ئاشکرا کردایە، وا نەدەبوو. بە کورتی، بوون و نەبوونی ئەو عیبادەتەی لە لا وەکوو یەک نییە و هێشتا دەروونی لە مەرایی شراوە خاڵی نییە.

عەلی دەیگوت کە رۆژی پەسلان بە قورعان خوێنان دەڵێن: «کاڵایان بە هەرزان پێتان نەفرۆشت؟ بۆ پێکهێنانی کاروبارتان رانەبوون؟ سەرەتا سلاویان لێتان نەکرد؟» واتە ئەمانە هەمووی مزی پەرستنەکەتانە کە وەرتانگرتووە و بە بێ‌خەوش نەتانهێشتۆتەوە. یەکێک لەو کەسانەی لە خەڵک‌وخوا هەڵاتووە و دوورەپەرێزی گرتووە و لە سووچێکدا خەریکی عیبادەت بووە، دەڵێ: «ئێمە لە ئاژاوە هەڵاتووین، کەچی ترسی ئەوەمان هەیە تووشی ئاژاوەیەکی‌تر بین؛ چونکە کاتێ کەسێ دەبینین، چاوەنۆڕین رێزمان لێ بنێ و مافمان رابگرێ».

لەم سۆنگەوە پاکان هانیان داوە تاکوو عیبادەتیان بشارنەوەو ئاشکرای نەکەن، هەر وەکوو چۆن کەسێک خراپەکانی دەشارێتەوە. چونکە تێگەیشتوون لە دوارۆژدا عیبادەتێ کە پاک و بێخەوش نەبێ وەرناگیرێ. ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە رێێ حەج دەگرێتە بەر و دەزانێ لە چۆڵ و بیابان بێجگە زێڕی پەتی، چیدی گیانی ناسێنێتەوە. چونکە رێگران بێجگە زێڕی بێخەوش هیچی‌تریان ناوێ؛ بۆیە ئەمیش دەڕوا زێڕی رۆژاوایی دێنێ و هەرچی زەغەڵی هەیە بەجێی‌دێڵێ و رێی چۆڵگە دەگرێتە بەر، بەو هیوایە لەو رۆژە ئاستەمەدا ئەو زێڕە فریای کەوێ و گیانی بپارێزێ؛ هیچ رۆژێک پتر لە رۆژی پەسلان مرۆ داماو و بێ‌دەرەتان نابێ. هەرکەس ئەمڕۆ کردەی پاک و پەتی کۆوە نەکا و نەیکاتە توێشوو دوارۆژی، لەو رۆژەدا نسک و ناهمێ و دەستە ئەژنۆ دەمێنێتەوەو کەس وەفریای ناکەوێ. مرۆڤ کە عیبادەت دەکا، تا بۆی گرینگ بێ مرۆیەکی‌تر سەیری دەکا یان ئاژەڵێ، لە مەرایی پاکژ نییە؛ تابۆی گرینگ بێ کە خەڵکی لە کاتی خواردن دەیبینن یان عیبادەت، لە رووبینی

خاڵی نییە. پێغەمبەر فەرمووی: «کەمترین و شراوەترین مەرایی، ئامبازدانان بۆ خودایە»؛ واتە لە عیبادەتدا ئامبازی بۆ خودا دانا و دڵی بە بوونی خوا ئۆقرەی نەگرت و بوونی کەسی‌تر بەسەر پەرستنیدا کاریگەر بوو.

**سەرنج:** کەنگێ شادبوونەوە لە ئاگاداری خەڵکی لە عیبادەت ڕەوایە.

بزانە هەرکەس شاد بێتەوە لە ئاگاداربوونی خەڵکی لە عیبادەتی، لە مەرایی بێ‌بەش نییە، مەگین شادبوونێ کە ڕەوابێ. ئەوەش چوار جۆرە:

**یەکەم** شاد بێ لەوەی کە نەیویستووە عیبادەتی ئاشکرا کا، کەچی پەروەرندەی بەبێ ویستی ئەم ئاشکرای کرد؛ هەر وەکوو چۆن گوناحی زۆری کردووەو پەروەردگار لە سۆنگەی بەزەیی و دلۆڤانی خۆیەوە بۆی شاردۆتەوە و ئاشکرای نەکردووە.

شاد بێ لەوەی کە خراپەکانی داشاردووە و چاکەکانی خویان کردووە، نەک شاد بێ بەوەی خەڵکی پێی بزانن و پەسنی کەن و پێیدا هەڵبڵێن؛ هەروەک پەروەردگار فەرمووی: قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ.

**دووەم،** شادوشوکر بێ و بڵێ کە پەروەرندەم لەم دونیایەدا خراپەکانمی شاردەوە، ڕەنگە لەو دونیاش ئاشکرایان نەکا؛ چونکە لە خەبەردا هاتووە کە پەروەردگار دەهندەتر و دلۆڤانتر لەوەیە کە گوناحی بەندەیەکی لەم دونیایەدا بشارێتەوەو لەو جیهاندا ئاشکرای کا.

**سێهەم،** شاد بێ بەوەی کە ڕەنگە ئەوانەی دیویانە ڕەدووی کەون و ئەمانیش بەختەوەری دوارۆژیان دەسکەوێ و هەم پاداشی شاردنەوەی عیبادەتی بەرکەوێ، چونکە ویستی کەس پێی نەزانێ و هەم پاداشی ئاشکراکردنی کە بەبێ‌ویستی ئەم ئاشکرا کراوە.

**چوارم،** شاد بێ بەوەی کە ئەو کەسەی عیبادەتی ئەمی دیوە، پەسنی دەکاو بڕوای چاکی پێ دێنێ و لەم سۆنگەوە -واتە پەسن و تاریفی چاکە- زۆرتر گوێڕایەڵ و ملکەچی پەروەرێنەری بێ و بە بەندەگی خودا شادوشوکر بێ، نەک پەسن و تاریف و پلە و پاگەی دونیا. دیاردەکەشی ئەوەیە کە هەرگا بەندەگی کەسێکی‌تر ببینێ، پێی شاد دەبێتەوە.

## شرۆڤەی مەراییەک کە کردەوە پووچەڵ دەکا

بزانە بیری مەرایی یان لە سەرەتا، یان کۆتایی یاخۆ لە نێوانی عیبادەتدا دێتە دی. گەر لە سەرەتای عیبادەتدا بێ، ئەو بەندەگییە پووچەڵ دەکاتەوە؛ چونکە بێ‌خەوشی پەرستن لە مەبەست و

١ ـ قورئان (١٠/٥٨) بڵێ شاد و شوکر بن بە بەزەیی و دلۆڤانی پەروەرێنەرتان.

نییەتدایە و ئەمەش مەبەست پووچەڵ دەکاتەوە. بەڵام گەر رووبینی لە بناغەی عیبادەتدا بێ، هەر وەکوو ئەوەی بە هۆی مەراییەوە لە سەرەتای کاتدا نوێژ بخوێنێ و گەر تەنیا بایە، نوێژی دەکرد بەڵام نە لە سەرەتای کاتدا؛ لەم بارودۆخەدا پاداشی سەرەتای کاتی پووچەڵ دەبێ، بەڵام پاداشی نوێژ کردنەکەی هەر وەکوو خۆی دەمێنێتەوە؛ چونکە نوێژەکەی لە سۆنگەی دینداریوە کردووە و بە تەنیایش هەر دەیکرد. وەکوو ئەوەی کەسێک لە خانوویەکی بە زۆر داگیرکراودا نوێژ کا؛ فەرزەکەی بەجێهێناوە، هەرچەند تووشی گوناح بووە، بەڵام خودی نوێژەکەی گوناح نییە؛ لێرەشدا چاوە لە نوێژدا نەبووە، بەڵکوو لە کاتەکەیدا بووە.

بەڵام گەر بە بێخەوش نوێژکاو پاشان بیری مەرایی بۆ بێ و ئاشکرای کا، نوێژەکەی پووچەڵ نابێتەوە، هەرچەند بەم ئاشکراکردنە، پاداشی کردەوەکەی وەرگرتووە.

دەگێڕنەوە کە کابرایەک گوتی: «دوێشەو سوورەی بەقەرەم خوێند». ئیبنی مەسعوود گوتی: «بەشی لەو عیبادەتەی هەر ئەوە بوو»؛ واتە ئەم ئاشکراکردنەی پاداشی ئەو عیبادەتەی بوو. یەکێک بە پێغەمبەر گوت: «رۆژووی بەردەوامم هەیە». فەرمووی: «نە بە رۆژووی، نە بێ رۆژووی»؛ دەڵێن مەبەستی ئەوە بووە کە چونکە گوتت بەتاڵ بۆتەوە. بە بڕوای من مەبەستی پێغەمبەر و ئیبنی مەسعوود ئەوەیە کە لە کاتی عیبادەتدا لە مەرایی بێ بەش نەبووە؛ بەڵام پێم وا نییە عیبادەتێ کە لە رووبینی بەدوور و تەکووز و تەواو بووبێ، دواتر پووچەڵ بێتەوە. هەروەها گوتوویانە مەبەستی پێغەمبەر ئەوە بووە کە نابێ رۆژووی بەردەوام بگیرێ[1].

بەڵام ئەوەی کە نێوانی نوێژدا دێ، گەر بەسەر بنەمای عیبادەتدا زاڵ بووبێ، نوێژ بەتاڵە. وەکوو ئەوەی شتێک لە نێوان نوێژدا بێتە بەرچاوی، یاخۆ شتێکی بزر کردبێ و بێتەوە یادی، گەر خەڵکی نەبن، نوێژەکەی ببڕێ، بەڵام لەبەر خەڵکی نوێژەکەی دوایی پێ دێنێ؛ ئەم نوێژە بەتاڵە، چونکە نییەتەکەی تێکچووە و درێژەدانەکەی لەبەر خەڵکە نەک خوا.

گەر نییەت وەکی خۆی بێ، بەڵام بوونی خەڵکی خێرایی و توانی زۆرتری بداتێ و نوێژەکەی جوانتر بەجێبێنێ، بەڕای من، بە تاڵ نەبۆتەوە؛ هەرچەند بە گوناحی چاوە تووش هاتووە. بەڵام گەر کەسێک عیبادەتەکەی ببینێ و پێی شاد بێتەوە، حارسی محاسبی دەڵێ: «رای جیاواز هەیە لەسەر ئەوەی کە نوێژەکەی بەتاڵە یان نە». دیسان دەڵێ: «من لەمەدا دڕدۆنگ بووم، بەڵام ئێستا دڵنیام کە بە تاڵ دەبێتەوە». دیسان گوتی: «گەر کەسێک بڵێ، «یەکێک لە پێغەمبەری پرسی من لە نهێنیدا عیبادەت دەکەم، بەڵام گەر کەسێک پێی بزانێ پێم خۆشەو شاد دەبم». پێغەمبەر لە پەرسڤیدا گوتی: «دوو پاداشت پێ دەدەن: یەکیان پاداشی بەرپیواری و یەکیان هی ئاشکرایی»،

---

[1] ـ باشترین جۆری رۆژووگرتن رۆژە نە رۆژێکە.

دەبێ پێی بڵێن ئەم خەبەرە موڕسەلە[1] و بێژەرەکانی بەردەوام نین». پاشان دەڵێ: «مەبەستی لەم پەیڤە ئەوە بووە کە ئەگەر پاش دوایی هێنان ئاشکرا بووبێ و پێی شادبووبێ، یا بەبۆنەی بەزەیی و دلۆڤانی پەروەردگارەوە شادوشوکر بووبێ کە پەرستنەکەی ئاشکرا کردووە -هەروەک پێشتر گوتمان- تا کەس نەڵێ شاد بوونەوە بەوەی کە خەڵک بە عیبادەتی کەسێک بزانن، پاداش پتر دەکا، هەرچەند گوناحیشی تووش ناکا». ئەمەی بێژرا، پەیڤی حارسی موحاسبی بوو. لە لای ئێمەش ئاشکراترین را و بۆچوون ئەوەیە کە گەر تەنیا پێی شاد بوو و شتێکی لە عیبادەتی ئاسایی خۆی زیاد نەکرد و نییەتەکەی هەر وەکوو خۆی مابوو و بەپێی ئەو نییەتە جوولایەوە، بەم چەشنە، نوێژ بەتاڵ نابێ. خوا چاتر لە هەمووان دەزانێ.

## شرۆڤە دەرمانی نەخۆشی رووبینی لە دڵدا

بزانە ئەم نەخۆشییە گورچکبڕەو گەلێک پرمەترسییەو دەرمانیشی فەرز و پێویستە. تا کۆشەوەی زۆری بۆ نەکەی، لە کۆڵت ناکەوێ؛ چونکە ئەم نەخۆشییە دەگەڵ مەزاجی دڵی مرۆڤ تێکەڵاوەو لە نێو دڵدا سەقامگیرە و بە تەواوی ریشەی داکوتاوە و دەرمانی زۆر دژوارە. هۆکەشی ئەوەیە کە مرۆڤ هەر لە سەرەتای منداڵیەوە دەبینێ کە خەڵکی بە مەرایی لەگەڵ یەکتر هەڵس‌وکەوت دەکەن، خۆیان بۆ یەکتر دەخەملێنن، بێجگە لەوەی هەن خۆیان دەنوێنن، کاری هەموویان، یا خۆ زۆرتریان هەر ئەمەیە. ئەم خووە لە دڵی منداڵدا گەشە دەکاو تەشەنە دەکاو گەورە دەبێ و هەر رۆژ زۆری زۆرتر دەبێ، تا ئەوەی ژیر و زانا دەبێ و دەزانێ کە ئەم خووە، هۆی زیان و فەوتانی ویە. کەچی تازە خووی پێکردووە و دەرمانی گەلێک دژوار و ماوەبەرە و کەس نییە لێی بێوەی بێ. ئەم کۆشەوەیە لەسەر هەموو خەڵکی پێویستە. لەم دەرمانەدا دوو پێگە هەیە:

**پێگەی یەکەم** -بە دەستهێنانی رەوانکەر: ئەم دەرمانە بنج و بناوانی ئەم نەخۆشییە لە دەرووندا تێک دەدا و ماجوونێکە کە لە زانست و کردەوە پێک هاتووە:

**دەرمانی زانستی** ئەوەیە کە پێویستی ئەو شتە بناسێ، چونکە هۆی کارێک کە لە مرۆڤ دەوەشێتەوە، چێژێکە کە لەو کاتەدا دەیبا. کە ناسی و زانی زیانی ئەو شتە ئەوەندەیە کە لە دوارۆژدا دەرۆستی نایەو لە وزەی بەدەرە، دەزانێ کە وازلێهێنانی ئاسانترە؛ وەکوو ئەوەی بزانێ لە هەنگوینێکدا ژارێکی کوشندە هەیە، هەرچەند زۆری حەزلێ بێ، بەلام دەتوانێ لە خواردنی خۆی

---

[1] ـ موڕسەل: حەدیسێ کە ئەوانەی گێڕاویانەتەوە تاکوو تابعێ دەگاو ئەویش لە پێغەمبەری گێڕاوەتەوە و ناوی ئەو ئەسحابەی لێی بیستووبە، نەڵێت.

بپارێزێ.

هەرچەن هۆی چاوە حەز لە شان‌وشکۆی دونیاییە، بەڵام سێ ڕەهەندی بۆ ڕەچاو دەکرێ: یەکەم حەز لە پەسن و تاریف و پێدا هەڵگوتن؛ دووەم ترس لە لۆمە و سەرکۆنە؛ سێیەم تەما لە خەڵکی کردن. بۆیە کاتێ عارەبێ لە پێغەمبەری پرسی: «چ دەڵێی پیاوێ شەڕکا لەبەر پیاوەتی، یان بۆ ئەوەی خەڵک ببینن، یان بۆ ئەوەی باسی بکەن؟» پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس بۆ سەقامگیربوونی تاکپەرستی خەبات کا، لەڕێێ خودایە». ئەمانە هەمووی هێمایە بۆ حەز بە پەسن و تاریف و ترس لە لۆمە و سەرزەنش.

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس بۆ بە دەستهێنانی پاوەنی حوشترێک خەزا کا، بێجگە لەو پاوەنە چیدی دەس ناکەوێ».

دەبێ حەز بە پەسن و تاریف لە دڵی خۆیدا بشکێنێ، بزانێ ڕسوایی ئەم حەزەی لە دوارۆژدا دەبینێ کاتێ کە گاسی دەکەن و دەڵێن: «هۆ مەرایی! هۆ خراپکار! هۆ لارێ! شەرمت نەکرد بەندەگی خودات بە پەسنی خەڵکی گۆڕایەوە و دڵی خەڵکت ڕاگرت و ئاوڕت لە ڕەزای پەروەرێنەرت نەدایەوە، لە خودا دوور کەوتی تا لە خەڵکی نزیک کەوی، پەسندی خەڵکت لە پەسندی خودا خۆشتر ویست، لۆمەی خودات بە پەسندی خەڵک گۆڕایەوە، کەس لە لات خوارتر لە خودا نەبوو، چونکە ڕەزای هەمووانت لە لا گرینگ بوو و ڕەزای ئەوت نەدەویست و هیچ ترست لە تووڕەبوونی نەبوو». کە مرۆڤی ژیر و خاوەن بیر لە چۆنییەتی ئەم ڕسواییەدا ڕاما، دەزانێ کە پەسن و تاریفی خەڵکی بایەخی دۆڕاندنی دوارۆژی نییە؛ بە تایبەت ڕەنگە ئەو بەندەگییەی کە بەجێی‌دێنێ ببێتە هۆی گرانترکردنی تای تەرازووی چاکەکانی، ئەگەر بە مەرایی بە زیانی نەدا و نەیخاتە سەر تای گوناحەکانی. گەر ڕوبینی نەکا، ڕەنگە ببێتە یار و دۆستی پێغەمبەران و پیاوچاکان، ئەگەر بە چاوە بەزیانی نەدا و نەیخاتە سەر تای گوناحەکانی. گەر ڕوبینی نەکا، ڕەنگە ببێتە یار و دۆستی پێغەمبەران و دۆستانی خودا. کەچی بەم مەراییەی، خۆی تووشیاری نگابانانی دۆژەدەکاو دەبێ بە دۆست و هەواڵی زیانکاران. ئەمانەی هەموو لەبەر ڕەزای خەڵکی بوو، ڕەزای خەڵکیش چجار بۆی پێک نایە؛ چونکە تا یەکێکیان لێی خۆش بن، ئەویتری لێ زیز دەبێ، کە یەکێک پەسنی کا، ئەوانی-تر لۆمەی دەکەن. بەڵام گەر هەمووشیان لێی خۆش بن و چاکەی بڵێن، چ کەڵکێکی بۆی هەیە؟ نە ڕزق و ڕۆژی لە دەستیان دایە، نەتەمەن، نە بەختەوەری دونیا و دوارۆژ. زۆر نەزانییە کە دڵی خۆی ئاڵۆز کا و خۆی بخاتە مەترسی سزا و دوژمنی پەروەرێنەری بۆ ئاوەها مەبەستێ. دەبێ هەر دەم بیر لەم شتانە کاتەوەو ئەم بیرانە لە دڵی خۆیدا نوێ کاتەوە.

بەڵام تەما و چنۆکی- هەر بەو جۆرەی لە بەشی خۆشەویستی ساماندا ڕاڤەمان کرد، بیناسێ و

دەرمانی کا. بۆ خۆی وا بیر کاتەوە کە ئەم چنۆکییە تا سەر نییە و ئەگەریش بێ، بە سووکایەتی و منەتنانەو رەزای پەروەردگار دەفرۆشێ بە سامانی دونیا و کەچی دڵی خەڵکیش بە بێ ئیزنی خوا بۆ کەس داگیر نابێ. کە مرۆڤ خوای لێخۆش بوو و لیێ رەزابوو، هەموو دڵێکیشی بۆ دێتە ژێر رکێف؛ بەڵام کە خودا لێی رەزا نەبوو، رسوا دەبێ و دەکەوێتە بەر رق و قینی دڵان.

ترسی لۆمەی خەڵکیش بەوە دەرمان کا کە بە خۆی بڵێ: گەر ئەم کارەم لە لای خودا پەسند بکرێ، لۆمەی خەڵکی هیچ بایەخێکی نییە و گەریش بینایی چاوان سەیری نەکا پەسندی خەڵکی چ کەڵکی نییە. گەر رێگای بێخەوشی بگرێتە بەر و دڵ لە خەڵکی دەرباز کا، خوا هەموو دڵەکان بە خۆشەویستی ئەو دەخەملێنێتەوە. ئەگەر وانەکا، زۆر ناخایەنێ مەرایی و دوڕازییەکەی لە هەمووان ئاشکرا کاو ئەو لۆمەی کە لیێ دەترسا تووشی دەبێ و رەزای خوداشی بۆی نامێنێ. بەڵام کە مرۆڤ دڵی تەیار بێ، یەک بیر و یەک را و بێخەوش بێ، لە گوێدان بە خەڵکی دەرباز دەبێ و رووناکی خودایی دەداتە دڵی و شتی جوان و یارمەتی پەروەردگاری بۆ دێتەدی و رێچکەی بێخەوشی و چێژو خۆشیەکەی بۆی ئاوەڵا دەبێ.

بەڵام **دەرمانی کردەوەیی،** دەبێ بە چەشنێ عیبادەت و پەرستنەکانی بشارێتەوە کە خەڵکی گوناح و خراپەکانیان دەشارنەوە، تا خوو بکا بە چاوتێربوون بە زانینی پەروەرندەی. ئەمە لە سەرەتاوە بۆی دژوارە، بەڵام بە کۆشەوە بۆی ئاسان دەبێ و لە بێخەوشی لە پەرستنی پەروەرندەی چێژی زۆر دەبا و وای لێ دێ کە ئەگەر خەڵکیش ببینن، ئەم خۆی لە خەڵکی بێ ئاگا دەبێ.

**پلەی دووەم** – دامراندنی بیری مەراییە. کە بیری رووبینی دێتەدی، هەرچەند ئەو کەسە خۆی بە کۆشەوە وا لێکردبێ کە تەمای سامان و پەسنی خەڵکی لە دڵی خۆیدا وشک کردبێ و هەموو ئەو شتانەی لەبەر چاودا سووک و بێبایەخ بووبێ، بەڵام دیسان شەیتان رەنگە لە نێوان عیبادەتدا بۆ مەرایی دنەی بدا:

### بیرگەلی مەرایی:

**یەکەم** بیرێک کە دێتە ئاراوە ئەوەیە دەیەوێ بزانێ کەس لەم عیبادەتەی ئاگەدارە یا هیوای ئەوەی هەیە کەسێک لێی ئاگەدار بێ.

**دووەم،** پاپایەکە کە لە نەفسدا دێتە دی بۆ ئەوەی بزانن پلە و پاگەیەکی لە لایان هەیە.

**سێهەم،** دانان بەم مەیل و حەزەیەو هان دانە بۆ پێکهێنانی ئەم پاپایە.

دەبێ سەرەتا هان بدا و کۆشەوەکا تا ئەو بیرەی بسڕێتەوە و بە خۆی بڵێ ئاگاداربوونی خەڵکیم بۆ چییە، هەر ئەوەی کە پەروەرندەم ئاگادارە، بۆم بەستە و گرێی کاری من بە دەستی خەڵک

ناکرێتەوە. گەر بیری دووەم لە پاپای پەسندی خەڵکی لە نەفسیدا جووڵایەوە، ئەوەی پێشتر بۆ خۆی راڤەی کرد و ئەو دۆزەی بۆ خۆی رەچاوی کرد، بێنێتەوە بیر و بزانێ پەسندی خەڵکی لە بەرانبەر نارەزایی پەروەرندەی چ کەلکی نییە و هەر بۆی زیانە و خەسار؛ پاشان ئەو ئارەزووەی کە دەیەوێ خەڵک پیێ بزانن گاسی دەکا، بەڵام دەبێ بە کرێت و دزێوی بزانێ و بەرگری لێ بکا و بە سەریدا زاڵ بێ؛ ئەوەی زاڵتر و بەهێزتر بێ نەفسی سەری بۆ نەوی دەکا.

**لە هەمبەر ئەو سێ بیرەدا سێ کاری‌تر دەبێ بکا:**

**یەکەم** زانینی ئەوەی کە دەکەوێتە بەر لەحنەت و تووک و نزای پەروەردگار؛

**دووەم،** دزێوییەک لە سۆنگەی ئەم زانینەوە دێتە دی؛

**سێهەم،** راوەستان و سڕینەوەی بیری مەرایی.

رەنگە ئارەزووی مەرایی وا لە دڵدا تەشەنە کا کە جێگایەک بۆ ناسین و بێز لێ‌هاتن نەهێڵێتەوە، یان ئەوەندە نەبێ شیاوی سەرنج بێ، هەرچەند پێشتر زۆر دنەی خۆی دابێ. کەوابوو، دەستی شەیتان دەکاردایە. ئەمە وەکی ئەوەیە زۆر لە سەر پشوودرێژی هان بدات و زیان و مێملی تووڕەیی بۆ خۆی دووپاتەت کاتەوە، بەڵام کە بەو ئارەزووە گەیشت، هەمووی لە بیر باتەوە و پشوودرێژی لە یاد کا و تووڕەیی بە سەریدا زاڵ بێ. هەروەها رەنگە بزانێ کە ئەوە مەراییە، بەڵام چونکە ئارەزووەکەی زۆر بەهێزە، کرێتیەکەی لێ ئاشکرا نەبێ؛ یاخۆ رەنگە کرێتیەکەشی لێ خۆیان بێ، بەڵام چونکە شاوەت زۆر بەهێزە، هیچی پێ نەکرێ و دەرۆستی نەیێ و پەسندی خەڵکی پێ خۆشتر بێ.

زۆر زانا هەیە کە دەپەیڤێ و بۆ خۆی چا دەزانێ کە مەرایی دەکاو زیانی خۆی تێدایە و کەچی لە کردەی خۆی پاشگەز نابێ و تۆبەکردنی دەخاتە دواوە.

کەواتە دەرۆستی مەرایی هاتن بە قەدەر هێزی دزێو زانینیەتی، هێزی دزێو زانینی بە قەدەر وزەی ناسینیەو وزەی ناسین بە قەدەر رادەی باوەڕەو باوەڕیش بە پیێ یاریدەی فریشتەکانە. چاوە بە قەدەر پاپای دونیایە و دنەدەری ئەو ئارەزووە شەیتانە. دڵی مرۆڤیش لە نێوان ئەم دوو لەشکرە هەڵگژاوەدایە. دڵیش وێکچوونێکی لە هەر یەک لەو دوو لایەنە هەیە. کە هەر یەکیان بە سەریدا زاڵ بوو، شۆپی ئەوە بە سەریدا دیارە و زۆرتر مەیلی ئەو لایەنەی هەیە. ئەو وێکچوونە پێشتر لە چارەی نووسراوە: چونکە مرۆ بەر لەوەی بۆ نوێژ رابێ وای لە خۆ کردووە کە یان ئاکاری فریشتەکانی لێ نزیک کەوێ و خووی ئەوانی بەسەردا زاڵ بێ، یان لەسەر رێچکەی شەیتان رۆیشتووەو خووی ئەوی گرتووە. لە نێوان نوێژدا کاتێ ئەو بیرە دێتە دی، ئەو خووە کە بەسەر دڵیدا داسەپاوە ئاشکرا دەبێ؛ پاشان چارەنووسی هەتاهەتایی سەرتر لە هەمووی ئەمانە هانی دەدا و بە غار بەرەو چارەنووسێ کە

یان لە فریشتەکان دەکا و یان لە شەیتان دەیبا.

**سەرنج:** ڕێگای لە ناوبردنی وازوازی مەرایی

کاتێ بە ئاوەژووی داخوازی مەرایی جوولایتەوەو بە دڵ بە کرێت زانی، گەر لە دڵدا ئارەزووی ئەو رووبینیە هەر مابووەوە، تۆ بەوە گوناحبار نیت، چونکە ئەوە سروشتی مرۆڤە کەوایە. پێت ئەمر نەکراوە کە سروشتی خۆت بە تەواوی بگۆڕی، بەڵکوو پێت گوتراوە بە سەریدا زاڵ بی و بیهێنیە ژێر ڕکێفی خۆت، تا تووشیاری هاویەت نەکا. کە هێزی ئەوەت دەسکەوت کە دەرۆستی بی و هەرچی دەڵێ گوێی پێنەدەی، ئاشکرا دەبێ کە بە سەریدا زاڵ بووی و هێناوتە ژێر ڕکێفی خۆت. هەر ئەوەندە بۆ لە کۆڵکردنەوەی ئەم ئەرکە بەستە. بێزی تۆ و دژایەتیت لەگەڵ ئەو شاوەتە، تۆڵەی ئەو ئارەزوویە. چونکە یارانی پێغەمبەر بە پێغەمبەریان گوت: «بیرگەلێکمان بە مێشکدا دێ کە گەر لە ئاسمان، بمانخەنە خوارەوە پێمان ئاسانترە لە سڕینی ئەو بیرە، کەچی زۆریش لامان دزێوە». پێغەمبەر فەرمووی: «بە بڤەتان زانی؟» گوتیان: «بەڵێ». فەرمووی: «ئەمە بڕوایەکی بێخەوشە و حسێبی ئەو بیرەش لەسەر خودایە». باوەڕی بێخەوش ئەوەیە کە ئەو بیرە بە دزێو نەگونجاو بیزانی نەک ئەوەی بەمێشکدا هاتنی ئەو بیرە. کەواتە چونکە بەکرێت زانینی ئەو بیرە، کەفارەیە بۆی، هەرچی بە وازوازی خەڵکوخواوە پێوەندی هەیە، چاتروایە بە هۆی کرێت زانینەوە لە دڵدا پاکژ بێتەوە. ڕەنگە کەسێک دەروستی وازوازییەکانی نەفس و شەیتان بێ و شەیتان دنەی بداو پێ بڵێ کە چاتروایە خەریکی شەڕوکێشە دەگەڵ شەیتان بێ؛ تا لەم وازوازی و کێشەی دڵەدا لە پەرستنی پەروەرێنەری چێژی زۆرتر نەباو ئەمەش هەڵەیە و چوار ئاستی هەیە:

**یەکەم،** خەریکی شەڕ و کێشە دەگەڵ شەیتان بێ و ئەمەش زۆر دەخایەنێ؛

**دووەم،** ئەوەی کە هەر بەوە بیبڕێتەوەو گوێی پێ نەدا و بە درۆی بخاتەوە و لە دڵ بێخاتە دەرەوە و بپەرژێتەوە سەر عیبادەت.

**سێهەم،** نە بیخاتە درۆوەو نە دەروستی بێ و نە بەرگری لێ بکا، چونکە بزانێ ئەمەش هەر زۆر دەخایەنێ و بەبێ ئەوەی سەرنجی بداتێ، درێژە بە عیبادەتەکەی بدا.

**چوارم،** هان و کۆشەوەیەکی فرەتر بکا لە دلبێشیدا، چونکە دەزانێ شەیتان لەوە تووڕە دەبێ و هیچ سەرنج نەداتە وازوازییەکانی شەیتان. چاترینیان هەر ئەمەیە، چونکە کە شەیتان دڵنیا دەبێ چاری ناکا، وازی لێ دێنێ. ئەمە وەکوو چیرۆکی چوار کەسە کە بۆ فێربوونی زانست دەکەونە ڕێ. لە ڕێدا تووشی کابرایەکی چاوچنۆکی چاونەزیر دێن، کە دەیەوی لە فێربوونی زانستیان پاشگەز کاتەوە. یەکەم کەس بە گوێی ناکاو پێسیری دەگرێ و دەگەڵی بەشەڕ دێ و بەم جۆرە ڕۆژگاری دەفەوتێنێ.

دووەمینیان دەگەڵی بەشەڕ نایێ و بەرگری لێ دەکاو ڕێگای خۆی دەبڕێ. سێیەمینیان نە بەرگری لێ دەکاو نە ئاوڕی لێ دەدا و ڕێگای خۆی درێژە پێ دەدا و بە شەڕ و کێشە کاتی خۆی بەفێڕۆ نادا. چوارەمینیان هیچ ئاوڕی لێ ناداتەوە، بلەزتر دەڕوا. ئەو چاوچنۆکە لە یەکەم و دووەم کەس شتێکی دەس دەکەوێ، بەڵام لە سێهەم کەس هیچی بۆ پێک نایە. لە چوارەم کەس نە تەنیا هیچی دەس ناکەوێ، بەڵکوو دەبێتە هۆی ئەوەی خێراتر و بلەزتر بڕوا. بۆیە گەر لەوانیتر پەژیوان نەبووبێتەوە، لە بەرگریکردنی ئەم یەکەیان پەژیوان دەبێتەوەو و دەڵێ بریا هیچم پێ نەدەگوت. کەواتە چاتر وایە تا دەتوانێ ئاوڕ لە وازوازی نەداتەوەو خێراتر بپەرژێتە سەر عیبادەت و پەرستنی پەروەردگار.

## شرۆڤەی ئیزن بۆ ئاشکراکردنی عیبادەت

بزانە قازانجی شاردنەوەی عیبادەت ئەوەیە کە لە رووبینی دەرباز دەبێ. لە ئاشکرا کردنیشیدا بەهرەیەکی گەورە هەیە و ئەوەش بریتییە لەوەی کە خەڵکی دەدەنە پەی و چاوی لێ دەبڕن بۆ کاری خێر و چاکە. بۆیە پەروەردگار پەسنی هەردوویان دەکاو دەڵێ: إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَـٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ[1] گەر بەراشکاوی چاکە بکەی زۆر باشە و گەریش بە نەهێنی بێ زۆر باشترە.

جارێک پێغەمبەر داوای پارەی کرد، یەکێک لە ئەنسار کیسەیەکی زێڕی هێنا. خەڵک کە ئەوەیان‌دی، هەموویان هێنایان.

پێغەمبەر گوتی: «هەرکەس ڕێچکەیەکی چاک دابنێ کە خەڵک ڕەدووی کەون، هەم پاداشی کردەوەکەی خۆی دەدرێتێ، هەمیش پاداشی پێڕەویکردنی خەڵکی». هەروەها ئەو کەسەش کە دەڕوا بۆ حەج یان خەزا و پاش تەیارکردنی خۆ و دابینکردنی پێداویستەکانی بێتەدەر و هانی خەڵکیش بدا، یان شەونوێژ بخوێنێ و بەدەنگی بەرز قورئان بخوێنێ تا خەڵکی لە خەورابن لەم ریزەیە.

گەر ئارخەیان بێ مەرایی توخنی ناکەوێ، ئاشکراکردنی چاکترە. بەڵام گەر لە خۆی دڕدۆنگ بێ و بترسێ ئارەزووی چاوەی ببزوێتەوە، ئاشکراکردنی و دنەدانی خەڵک هیچ قازانجی بۆی نییە و شراوەبوونی چاکترە. کەواتە هەرکەس عیبادەتی ئاشکرا دەکا، دەبێ لە شوێنێکدا بێ کە دڵنیا بێ خەڵک چاوی لێ دەبڕن و دەکەونە دووی. کەسی وا هەیە بنەماڵەکەی پێڕەوی لێ دەکەن، کەچی خەڵکی بازاڕ ئاوڕی لێ نادەنەوە. کەسی واش کە خەڵکی بازاڕ ئاوڕی لێ دەدەنەوەو خەڵکیتر نە.

---

[1] ـ (قورئان، ٢/٢٧١).

هەروەها دەبێ زۆرتر ئاگاداری دڵی خۆی کا، چونکە زۆرتر بۆی هەیە ئارەزووی مەرایی لە ناخی دڵدا بۆسەی گرتبێ و بە بیانووی دنەی خەڵکی، پێی ئاشکرای کاو ببێتە هۆی فەوتانی عیبادەتەکانی. ئەمە وەکوو ئەو کەسەیە کە خۆی مەلە نەزانێ و دەستی کەسێکی‌تریشی گرتبێ تا پێکڕا نوقم بن و بخنکێن. بەڵام ئەوەی بەهێزەو لە خۆی ئارخەیانە، وەکوو مەلەوانێکی شارەزاو لێهاتووە کە هەم خۆی چاک مەلە دەکاو هەم کەسانی‌تر دەرباز دەکا. ئەمە ئاستی پێغەمبەران و یارانی خودا و پاکانە. هەروەها کەس نابێ بەمەش لە خۆبایی بێ و عیبادەتێ کە دەتوانێ بەنهێنی بە جێی بێنێ، ئاشکرای کا. نیشانەی راستی لەم کارەیدا ئەوەیەکە گەر وابیر کاتەوە کە پێی دەڵێن عیبادەتی خۆت بشارەوە تا خەڵکی بکەونە دووی فلان پارێزگاری‌تر، کەچی هەر ئەو پاداشەی کە دەدرێتە ئەو بە تۆش دەدرێ، بەڵام لە دڵدا حەزێکی بۆ ئاشکراکردن بینی، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە کەلکەڵەی شان‌وشکۆی دونیایە نەک بەندەگی خودا.

شێوازێکی‌تر بۆ ئاشکراکردنی عیبادەت ئەوەیە کە پاش دوایی پی هێنانی، بیگێڕێتەوە کە چی کردووە و لەمەدا نەفسی چێژی زۆر دەبا و رەنگە نەختێ فشەیشی لەگەڵ بێ؛ لە سەری پێویستە کە ئاگاداری زمانی بێ و باسی نەکا تا ئەو کاتەی کە لۆمە و پەسنی خەڵک بۆی یەکسان بن و پەسندکردن و نەکردنی خەڵک بۆی بەرانبەر بێ. ئەوسا کە زانی گێڕانەوەی ئەم باسە دنەدەری خەڵک و خوایە بۆ چاکەکردن، بیگێڕێتەوە. زۆربەی گەورەکان کە مەراییان لە خۆدا کوشتووە، رایان وابووە.

سەعد کوڕی مەعاز دەڵێ «لەو دەمەیڕا بوومەتە موسوڵمان، نەفسم بێجگە لەو پەیڤانەی لە دواڕۆژدا لیێ دەپرسن، هیچ باسی‌تری دەگەڵ نەکردووم. هەروەها هەرچیم لە پێغەمبەر بیستووە، ئارخەیان بووم کە لە راستی کلانەبووە».

عومەر گوتی: «هیچ خەمم نییە کە بەیانی لە خەو رادەبم، کاروبارم لەلاگران بێ یان ئاسان؛ چونکە نازانم خێرم لە چی دایە». ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «بەیانی لەسەر هەر دۆخێ لە خەو رابم، ئاواتی شتێک بێجگە لەو دۆخەم بە دڵدانایە». عوسمان دەڵێ: «لەو دەمەیڕا دەگەڵ پێغەمبەر پەیمانم بەستووە، نە دەستی راستم لە شەرمگام داوە، نە گۆرانیم گوتووەو نە درۆم داوە». ئەبوو سوفیان لە گیانەلادا گوتی: «بۆم مەگرین، چونکە لەو کاتەوە بوومەتە موسوڵمان گوناحم نەکردووە». شەداد کوڕی ئووس گوتی: «لەو دەمەیڕا بوومەتە موسوڵمان، هیچ قسەیەکم نەگوتووە مەگین ئەوەی بە جوانی هەڵمسەنگاندبێ، ئەوە نەبێ بە خولامەکەی خۆمم دەگوت، تا چێشت دێنن، ئەو سفرە بێنە یاری دەگەڵ کەین». ئەمانەی بێژران پەیڤی بڕواداڕانی بەهێزبوو و نابێ سست و کەمهێزان بیکەنە بەڵگەو دووپاتەی کەنەوە. بزانە پەروەردگار لە هەر کارێکدا وردەکاری زۆری داناوە کە کەس رێ

ناباتە سەریان و لە ژێر هەر شەڕێکدا خێرێک حەشار دراوە کە مەمانان ڕێیّ پێ نابەین؛ لە مەراییشدا خێری زۆر شراوەتەوە هەرچەند بەشی مەراییکەر فەوتانە؛ چونکە زۆرکەس لە سۆنگەی رووبینیەوە برێ کاریان لێ دەوەشێتەوە کە خەڵک پێیان وایە بێخەوشانە ئەم کارەیان کردووە و رەدوویان دەکەون و لە چاکەدا رکەبەرێی دەگەڵ دەکەن.

## چیرۆک

دەگێڕنەوە لە بەسرەدا، بەیانیان لە هەموو کۆڵانێک دەنگی قورعان و یاد و زیکر بەرز بوو و خەڵکی زۆر بۆ ئەم کارە دنەدەدران. کابرایەک کتێبێکی نووسی لەسەر وردەکارییەکانی رووبینی، وازیان لەم کارە هێنا و حەزیان کەم بۆوە. گوتیان بریا ئەم کەسە ئەم کتێبەی نەدەنووسی. کەواتە رووبین دەبێتە قوربانی کەسانیتر، خۆی دەفەوتێ و خەڵکی رزگار دەبن.

## شرۆڤەی ئیزنی شاردنەوەی گوناح

بزانە، ئاشکراکردنی پەرستن، رەنگە مەرایی بێ، بەڵام شاردنەوەی گوناح بە حەوت بۆنەوە، هەموو کات رەوایە:

**یەکەم**: پەروەردگار فەرموویە گوناح و خراپکاریتان بشارنەوە. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس خراپەیەکی لێ بوەشێتەوە، دەبێ پەردەی پەروەردگاری بە سەردا بدا».

**دووەم**: کە لەم جیهانەدا شراوە مایەوە، مزگێنیە بۆ ئەوەی لە دوارۆژیش ئاشکرا نەبێ و بە بەرپیواری بمێنێتەوە.

**سێهەم**: بترسێ لە لۆمە و تانووتی خەڵکی، چونکە هەم دڵی دەپەرژێنێتە سەر خۆ، هەم عیبادەتی تێک دەدا و هەم بیری دەئاڵۆزێنێ.

**چوارم**: دڵ بە لۆمە و تیزوتانە دەڕەنجێ -ئەمە بەشێ لە سروشتی مرۆڤە- و زیزبوون و دڵ ئێشان لە لۆمەی خەڵکی و دوور لێگرتنی حەرام نییە. ئەوەی کە مرۆڤ پەسن و لۆمەی لەلا وەک یەک بێ، لە سەرترین پلەکانی تاکپەرسیتیەو هەرکەس پێیّ ناگا. بەڵام پەرستن لە ترسی لۆمە، رەوا نییە؛ چونکە پەرستن دەبێ بێخەوش و پاک بێ.

مرۆڤ لە وزەیدا هەیە کە پەسنی نەکەن و تاریفی نەدەن. بەڵام لە هەمبەر لۆمە و تانووت ناتوانێ پشوودرێژ و بەکاوەخۆ بێ.

**پێنجم**: ئەوی کە بترسێ تەمای ئازار و سزادانی بکەن. شەرع ئیزنی داوە کە گەر حەددێکیش لە سەری پێویست بێ، بیشارێتەوەو لە کردەوەی خۆی پاشگەز بێ؛ کەواتە دووری لە شەڕێکیتر

رەوایە.

**شەشەم**: لە خەڵک شەرم کاو شەرمیش پەسندکراوەو بەشێ لە ئیمانە. شەرم شتێکەو رووبینی شتێکیتر.

**حەوتەم**: ئەوەی کە بترسێ گەر گوناحەکەی ئاشکرا کا، خراپکاران پێڕەوی لێ کەن و لە گوناحکردندا بەزەبرتر بن.

کە بەم مەبەستانەوە شاردیەوە، رەوایە، بەڵام گەر مەبەستی ئەوە بوو کە خەڵکی بە پیاوێکی پارێزکاری بزانن، ئەوە مەراییەو حەرامە. گەر کەسێک رواڵەتی و دڵی وەکوو یەک بوون، ئەوە ئاستی راستانە. ئەمەش وا دەبێ کە تەنانەت لە دەروونیشدا هیچ گوناح نەکا؛ بەڵام کە کردی، ئەگەر بڵێ: «هەرچی خودا دەیزانێ، بڵێ با خەڵکیش بیزانن»، ئەوە نەزانی و ناڕەوایە؛ چونکە راگرتنی پەردەی پەروەردگار فەرزە.

## شرۆڤەی ئیزنی دەس راگرتن لە کاری چاکە لە ترسی رووبینی

بزانە، پەرستن سێ رەهەندی هەیە: **یەکەم** ئەوەی کە هیچ پێوەندی بە خەڵکەوە نییە، وەکوو نوێژ و رۆژوو؛ **دووەم** ئەوەی کە پێوەندی بە خەڵکەوە هەیە، وەکی فەرمانڕەوایی و دادوەری و حوکمداری؛ **سێهەم** ئەوەیە کە هەم بەسەر خەڵک و هەم بەسەر ئەوەی بە جێی دێنێ کاریگەرە، وەکوو ئامۆژگاری و پەند و فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە.

**بەشی یەکەم**، وەکی نوێژ و رۆژوو و حەج، نابێ قەد لەبەر ترسی مەرایی و رووبینی وازی لێ بهێنرێ؛ نە فەرز و نە سوننەت.

کاتێ بیری مەرایی لە سەرەتا یا خۆ نێوانی ئەم پەرستنەدا هاتەدی، دەبێ هان بدا دڵی لە مەرایی پاکژ کاتەوەو بە بۆنەی بوونی خەڵکەوە نە پەرستنی زۆرتر کاو نە کەم. کاتێ نییەتی بە تەواوی لێگۆڕا و بوو بە مەرایی، ئەوە ئیدی پەرستن نییە، بەڵام تا بنەمای نییەت هەبێ، پێویست ناکا دەستی لێ هەڵگرێ.

فوزەیل دەڵێ: «مەرایی ئەوەیە کەسێک لە پەرستن واز بێنێ لەبەر روانینی خەڵکی، بەڵام ئەوەی لە بۆ خەڵکی خودا بپەرستێ، ئامبازی بۆ خود داناوە، واتە موشریکە». بزانە شەیتان پێی خۆشە کە تۆ خودا نەپەرستی، کە ئەوەی پێ نەکرا، پێت دەڵێ: «خەڵکوخوا سەیرت دەکەن، ئەوە مەراییە، نەک عیبادەت» تا بەم فێڵە لە پەرستن دوورت خاتەوە. ئەگەر خێی پێ بدەیت و هەڵبی و لە ژێر زەویدا عیبادەت کەی، لەوێش لە کۆڵت نابێتەوەو پێت دەڵێ: «خەڵک دەزانن هەڵاتووی و بوویتە پارێزگار،

ئەمە پارێزکاری نییە، رووبینیە». دەبێ پێی بلێی: «دڵ لە لای خەڵکبوون و واز لە پەرستن هێنانیش هەر مەراییە، دیتن و نەدیتنی خەڵک وەک یەکن؛ ئەوەی پێشتر هۆگری بووم، هەنووکەش هەروا خێی دەدەمێ و وا بیر دەکەمەوە کە خەڵک نابینن». وازهێنان لە پەرستنی خودا لە ترسی خەڵک، وەکی ئەوەیە گەنم بدەیتە خولامەکەت بۆتی پاکژ کا، پاکی نەکا و بلێ: «ترسام کە نەتوانم بە جوانی بۆتی پاککەم». دەڵێی «ئەی نەفام! تۆ کاری سەرەکیت وازلێهێناوە، کوو دەتوانی پاکی کەی».

کەوابوو، هەرچەند بەندەیان فەرمان پێداوە کە بێخەوشانە عیبادەت کا، بەڵام کە وازی لە پەرستن هێنا، وازی لە بێخەوش بوونیش هێناوە، چونکە دلبێشی لە کردەوەدایە. بەڵام ئەو سەربهوردەی کە لە ئیبراهیمی نەخەعی دەگێڕنەوە و دەڵێن کاتێ قورعانی دەخوێند و کەسێک دەهاتەژوور، قوعانەکەی لێک دەنا و دەیگوت: «نەکوا بزانن من هەموو کات قورعان دەخوێنم». ئەمەی بۆیە کردووە چونکی زانیویە کە کەسێک بێتەژوور، دەبێ دەگەلی قسە بکاو قورعان خوێندن واز لێ بێنێ. کەواتە شاردنەوەی هێژاترە. حەسەنی بەسری دەڵێ: «کەس بووە قولپی گریانی بەربینگی پێگرتووە و لەبەر ئەوەی خەڵک نەیبینن دایشاردووە». ئەمەش رەوایە چونکە ئەسرین دارژاندن لە گریانی دەروون و پەنامەکی هێژاتر نییە؛ ئەمە عیبادەتێ نییە کە وازی لێ هێنابێ. دیسان دەڵێ: «کەس بووە ویستوویە کۆسپێک لەسەر رێگەی خەڵکوخوا لابا و لای نەبردووە تا نەڵێن پارێزکارە»، ئەمە بارودۆخی کەسێکە کە زۆر لاوازە و دەترسێ خەڵک پێێ بزانن و عیبادەتەکانیتری شپریۆ بن.

بەڵام دووریکردن لە لابردنی کۆسپ و چەڵەمە لەسەر رێی خەڵکی، لەبەر ناوبانگ دانەخستن، جوان نییە؛ بەڵکوو دەبێ ئەو چاکە بکرێ و مەرایی لە دڵ لابرێ، مەگین کەسێک زۆر لاواز و سست بێ و چاکەوخێری خۆی لەوەدا بزانێ. لەمەشدا کەمایەسی هەیە.

**بەشی دووەم** ئەوەیە کە پێوەندی بە خەڵکەوە هەیە؛ وەکوو دادوەری و حکوومەت. ئەمەیان گەر بە دادوەری بڕازێنرێتەوە، لە عیباداتی هەرە گەورەیە؛ بەڵام گەر لە داد بێبەش بێ، لە گوناحانی هەرەگەورەیە. هەرکەس لە خۆی ئارخەیان نەبێ کە دەتوانێ دادوەرانە ببزوێتەوە، ئەم کارانەی لێ حەرامە؛ زیانی ئەمە گەلێک گەورەیە و وەکی نوێژو رۆژوو نییە کە چێژو خۆشی لەوەدایە کە خەڵک پێی بزانن. حوکمداری چونکە چێژێکی زۆر گەورەیە و نەفس پێی قەڵەو دەبێ، شیاوی کەسێکە کە بەسەر خۆیدا زاڵ بێ و لە خۆی دڵنیا بێ. گەر کەسێک بەر لە حوکمداری خۆی تاقی کردبێتەوەو رووسپی دەرهاتبێ، کەچی بترسێ کە دەستەڵاتی دەس کەوت، رەنگە بگۆڕێ و لە ترسی لاچوون، رکەبەرێ کا، لەمەدا رای جیاواز هەیە: تاقمێ گوتوویانە دەبێ بیپەزێرێ، چونکە ئەوە گریمانەیەک زۆرتر نییە. خۆی تاقی کردۆتەوە، دەبێ بەخۆی متمانەی هەبێ. بەڵام رای من ئەوەیە کە توخنی

نەکەوێ، چونکە نەفس کاتێ دەتوانی متمانەی پێ بکەی کە حکوومەتی بە دادی کردبێ؛ رەنگە ئەوە فێڵێک بێ و کە دەستەلاتی دەسکەوت، خۆی بدۆڕێنێ. کە هەر لە سەرەتاوە دڕدونگە، رەنگە ئالوویری بە سەردابێ، بۆیە دوورەپەرێزی هێژاترە.

حوکمداری تەنیا کاری بڕوادارانی دڵ قایمە. ئەبووبەکر بە رافعی گوت: «قەد حوکمداری مەکە، هەرچەند تەنیا بەسەر دوو کەسدا بێ». پاشان کاتێ ئەبووبەکر جێنشینێ پێغەمبەری لە ئەستۆ گرت، رافع گوتی: «تۆ کە بەرگریت لە من دەکرد، ئێستا خۆت لە ئەستۆت گرتووە؟» گوتی: «ئێستاش پێت دەڵێم قەد حوکمداری مەکە. لەحنەتی خوداش لەو کەسەی کە دادوەری نەکا». ئەمە وەکوو ئەوەیە بابێک بەرگری لە کوڕەکەی بکا و نەهێڵێ بڕواتە لای چۆم، کەچی خۆی چونکە مەلە دەزانێ، مەلەی تێدا بکا. گەر منداڵەکەشی وا بکا لە ئاودا دەخنکێ. لە سەردەمی پادشای ستەمکاردا کە دادوەری بووز نەخواو باوی -دوڕازی بێ- نابێ کاری دادوەری و هیچ حوکمدارییەکیتر لە ئەستۆ بگیرێ. ئەگەر لە ئەستۆی گرت، نابێ لە ترسی لەکار لابردن، دادوەری نەکاو لە راستەڕێ لابدا، بەڵکوو دەبێ دادوەری کا و بێجگە لە راستی ئاوڕ لە چیدی نەداتەوە تا ئەوەی کە لا دەبرێ. هەروەها دەبێ شاد و شوکر بێ کە دادوەری دەکا، ئەگەر حوکمداری بۆ رەزای خودا دەوێ.

**سێهەم**، پەند و فتوا و وانەگوتنەوەو گێڕانەوەی حەدیسە. لەمەشدا چێژێکی زۆر گەورە هەیە و مەرایی لەمەشدا پتر لە نوێژ و رۆژووە، ئەمەش لە حوکمداری نزیکترە. تەنیا ئەم جیاوازییەیان هەیە کە پەند و ئامۆژگاری و گێڕانەوەی حەدیس، چۆن بەسەر بیسەردا کاریگەرە، بەسەر بێژەریشدا کاریگەری هەیە و لەمەرایی دووری دەکاتەوە و بۆ خوداپرستی گاسی دەکا، کەچی حوکمداری وا نییە. کەواتە گەر کەسێک مەرایی بۆ هاتەگۆڕێ، دەم و دەس دەبێ واز لەوانە بێنێ. تاقمێ لەوەش خۆیان پاراستووە. زۆربەی یارانی پێغەمبەر کە فتوایەکیان لێیان دەپرسین، دەیانخستە ئەستۆی کەسێکیتر.

بێشری حافی چەن دۆلاب حەدیسی لە ژێر خاکدا شاردەوەو گوتی: «ئارەزووی حەدیسوانی لە خۆمدا دەبینم، گەر نەمدیایە دەیانمگێڕاوە».

پێشوونان گوتوویانە کە پەیڤی «حدثنا» دەرگایە کە بەرەو دونیا و هەرکەس بیڵێ، مەبەستی ئەوە کە «لە ژووری کۆڕم دانین».

یەکێک ئیزنی خواست لە عومەر کە هەموو بەیانییەک خەڵکی ئامۆژگاری کا لە کۆڕێکدا، عومەر ئیزنی پێ نەداو گوتی: «دەترسم ئەوەندە فوو لە قولی خۆت کەی کە بنووسی بە تەشقی ئاسمانەوە». ئیبراهیمی تیمی دەڵێ: «کاتی ئارەزووی ئاخافتنت لە خۆدا دی، بێدەنگ بەو کاتی

ئارەزووی بێدەنگیت بینی قسە بکە». بە رای من واتای ئەم پەیڤە ئەوەیە کە پەندوەرگر و پەندبێژ سەیری دڵی خۆی کا، گەر مەبەستی لە پەیڤین بەندەگی پەروەردگارە و نەختێ بیری مەراییشی تێدا دیارە، قسە بکات و پاشگەز نەبێ. ئەم مەبەستە لە دڵی خۆیدا رابێنێ تا بەهێز و خوستتر بێ. دەستووری ئەمە وەکوو دەستووری نوێژی سوننەتە کە لە سۆنگەی بیری مەراییەوە وازی لێ ناهێنرێ، تا کاتێ نییەتی بۆ پەروەردگار دەگەڵدا بێ. بە ئاوەژووی حوکمداری کە ئاوێتە بوو دەگەڵ مەرایی، دەبێ دەم و دەس لێی دوور بگری؛ چونکە مەبەستی خراپ، خێرا زاڵ دەبێ.

لەم سۆنگەوە بوو ئەبووحەنیفە کاتی حوکمدارییان پێ ئەسپارد و کردیانە دادوەر، خۆی لێ بوارد و گوتی: «من شیاوی ئەمە نیم» گوتیان: «بۆچی؟» گوتی: «ئەگەر راست دەڵێم، شیاو نییە کە خۆم دابنێم، گەریش درۆ دەکەم، درۆزن شیاوی دادوەری نییە». بەڵام لە وانە وتنەوەو فێرکاری خۆی نەبوارد.

بەڵام گەر لە خۆیدا هیچ مەبەستی عیبادەت شک نابا و تەنیا ئارەزووی مەرایی و دەسخستنی شانوشکۆیە، لە سەری فەرزە وازی لێ بێنێ. گەر لە ئێمە پرسیار کەن «چ بکەین؟» دەڵێین: گەر لە پەیڤیدا هیچ کەلکێ نەبوو بۆ خەڵکی، وەکوو کەسێک کە پەندەکانی لە ماکی تامات[1] و پەیڤی سەروادار و ئەو وتانە بن کە خەڵکی بەهۆی بەڵێنی بەزەیی خوداوە بەرەو گوناحکردن دنە دەدەن، یاخۆ فێر کردنەکەی، وانەی شەڕەقسەو خەلاف بێ کە تووی رژدی و چنۆکی لە دڵ دەچێنن، دەبێ لەو پەیڤانە بەربەست بکرێ؛ چونکە بەربەستکردنی ئەو کەسە خێر و ودمێکی هەرەگەورەیە، هەم بۆ خۆی و هەم بۆ خەڵکی. بەڵام گەر ئاخافتنی کەلکی بۆ خەڵکوخوا هەبێ و لەسەر هێڵی شەرع کلا نەبێ و خەڵک بە بێخەوشی بناسن و فێرکردنەکانی بۆ دین بەکەڵک بێ، ئیزنی نادەین کەوازی لێ بێنێ؛ چونکی دووری ئەم کەسانە، زیانی خەڵکی تێدایە و ئەمانەش فرەن و لە پەیڤیاندا تەنیا خۆیان زیان دەکەن؛ لە لای ئێمەش قازانجی چەن کەس چاترە لە زیانی یەک کەس. ئەم کەسە دەکەینە قوربانی خەڵکی؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەردگار ئەم دینە بە هۆی کەسانێکەوە سەر دەخا کە خۆیان هیچ بەشی لێ نابەن». مەبەست لەمەش هەر ئەو تاقمەیە. کەواتە پێی دەڵێین دەست هەڵمەگرە و کۆشەوە کە تا لە مەرایی خۆ ببوێری و مەبەستت پاکژ کەو لە پەندەکانت سەرەتا خۆت بەهرە وەرگرە و لە پەروەرندەت بترسە و پاشان خەڵکی لێ بترسێنە.

---

١ ـ تامات (طامات: کۆی طامه): طامة و لەتە: بەڵای گەورە، بە رۆژی پەسلان دەڵێن «طامـة الكبـرى» چونکـە لـەو رۆژەدا هـەموو بوونێک دەفەوتن و نامێنن. طامات: بریتیە لەو زاراوانەی کە سۆفی لە سەرەتای رێگایـدا دەیـڵێتەوە. خواجـە عەبدولـڵای ئەنـساری دەڵێ: تامات زاراوەیەکە بە واتایەکی لێڵ و نادیار، یان هێمایەکی بەرپیوار. نیشانەی ئەوەیە کە سۆفی هێزێکی هەیە یا پێـی وایـە کـە هەیەتی و خەڵکی لە وزەیان بەدەرەو ئاوەز فامی ناکاو دڵ لیێ تێناگا (فرهنگ اصطلاحات عرفانی؛ سجادی).

**پرسیار:** گەر کەسێک بڵێ: چۆن بزانین مەبەستی پەندبێژ بێخەوشەو لە راستەڕێ کلانەبووە و نیشانەی چییە؟

**وەرام:** کەسێک مەبەستی راستە کە دۆزی ئەوە بێ خەڵکی لەسەر ریێ خودا بن و لە دونیا دوور بگرن، تەنیا لەبەر بەزەیی هاتنەوە بە خەڵک. گەر کەسێک هات کە پەندەکانی بە کەڵکتر و پەیڤەکانی دلگرتر بوون، دەبێ پیێ شادوشوکر بێ؛ وەکوو ئەوەی کەسێک کەوتبێتە نێو بیرێکەوەو گا بەردێک لەسەر بیرە کە بێ و ئەمیش بییەوێ لەبەر بەزەیی و دڵۆڤانی ئەو بەردە لاباو ئەو کەسە دەرباز کا؛ ئەمەش تەنیا بە هەوڵ و کۆشەوەی زۆر دەگاتە ئەنجام. بەڵام کە کەسێک هات ئەم بەردە لاباو ئەم ئازارەی لە کۆڵ کاتەوە، دەبێ پێی شاد بێ. کە ئەم پەندبێژە شاد نەبوو بە هاتنی پەندبێژێکی بەهازتر و لە خۆیدا رق و رژدی بینی، دەبێ بزانێ کە ئەم ویستوویە خەڵک بەرەو لای خۆی گاس کا نەک خوا. دیاردەیەکیتر ئەوەیە کە گەر دونیاداران و حوکمداران لە کۆڕەکەیدا بەشدار بوون، نابێ پەیڤی بگۆڕێ و لەسەر خووی پێشووی لابدا. هەروەها کە قسەیەک هاتە گۆڕێ کە خەڵک نەعرەی پێ بکێشن و بگرین و ببوورنەوە و ئەو پەیڤە لەسەر بنەمایەک نەبوو، دەبێ خۆی لەو وتەیە دوور بگرێ. دەبێ ئەم شتانە لە دەروونی خۆیدا ببینێتەوە و گەر بینی و لە لای سهێت نەبوو، ئەمە رووبینی پەتییە، کەچی گەر کرێتی بینی لە ناخی خۆیدا، دیارە بێجگە لەوە مەبەستیتریشی هەیەو دەبێ هان بدا ئەو مەبەستەی بەسەر ئەم رووبنییەدا داسەپێنێ.

**سەرنج:** حەز بە عیبادەت هەموو دەم مەرایی نییە.

زۆر جار مرۆڤ بە هۆی بوونی مەردمەوە لە عیبادەتدا ئازارتر دەبێ و ئەم لێهاتوویە راستە و هیچ بە مەرایی نایێتە هەژمار؛ چونکە بڕوادار هەموو دەم تامازرۆی عیبادەتە، بەڵام رەنگە کۆسپێک بووبێتە بەربەستی. رەنگە لە سۆنگەی خەڵکەوە ئەو کۆسپە نەمێنێ و تاسەی عیبادەتی ببزوێتەوە. وەکوو ئەوەی کەسێک کاتێک لە ماڵی خۆیدایە، نوێژی شەوی پێ گرانە؛ چونکە دەگەڵ بنەماڵەکەی خەریکی قسەو باس و خەوتن دەبێ و جلکی خەوی دەبەر کردووەو پێخەفی راخستووە؛ بەڵام کە لە خانووی کەسیتردا بوو، ئەم کۆسپانە نین و چاکتر و ئازارتر دەتوانێ شەونوێژ کا؛ یان شوێنی نووستنەکەی غەریب بێ و خەوی لێ نەکەوێ: خەریکی شەونوێژ بێ؛ یان تاقمێ ببینێ کە خەریکی شەونوێژن، ئەمیش هان بدرێ و خەریکی عیبادەت بێ؛ یان لە جێگایەکدا بێ کە هەمووان رۆژوو بن، یاخۆ خواردن تەیار نەبێ، حەزکا کە رۆژوو بگرێ؛ یا لە مزگەفتدا تاقمێ ببینێ کە خەریکی نوێژی تەراویحن و ئەم بۆ خۆی لە خانوودا توانی نوێژی بە تەنیای نەبێ، کەچی کە ئەو خەڵکەی بینی، هێز و گوڕ بە دەس دێنێ و خەریکی نوێژ خوێندن دەبێ؛ یان رۆژی هەینی خەڵک ببینێ کە چۆن

پەرژاونەتەسەر عیبادەتی خودا، ئەمیش دنەدەدریّ و پتر لەوەی جاران دەیکرد، عیبادەت کا؛ ئەمانە هەموویان رەوان و هیچ بە مەرایی نایەنە ئەژمار. شەیتان پێی دەڵێ: «مەکە، ئەمە لەبەر خەڵکوخوایە و بە رووبینی بۆت دەنووسریّ»، یان رەنگە ئەو ئازایی و خێراییە لە عیبادەتدا لە سۆنگەی بوونی خەڵکەوە بێ نەک پاپای خێر و ودم و نەمانی کۆسپ و تەگەرە، پاشان شەیتان بڵێ: «مەکە» و فریشتەکان بڵێن: «عیبادەت کە، ئەم حەزەت پێشتریش لە دڵدا بووە، بەڵام ئەو کۆسپانەی لەسەر ریّگات بوون نەیاندەهێلا، هەنووکە ئەو کۆسپانەت نەماون». کەواتە دەبێ ئەم دوانە لێک جیا کاتەوە. نیشانەکەشی بەم چەشنەیە کە دەبێ وابزانێ کە خەڵک هیچ ئەم نابینن و هەر تەنیا ئەم خەڵک دەبینێ، جا بزانە هەروا حەز بە عیبادەت دەکات یا نە؟ گەر حەزی دەکرد، خێرە و گەر حەزی نەکرد، ئەوە مەراییەو دەبێ خۆی لێ بپاریزێ. گەر هەردوو تامازرۆیی لە دڵدا بینی، واتە هەم حەز بە عیبادەت و هەمیش دیتنی خەڵکی، دەبێ وردبێتەوەو بزانێ کامیان زاڵترن و متمانەی پێ بکا. هەروەها رەنگە دەنگی قورئانێ بژنەفێ و خەڵک ببینێ کە دەگرین، ئەمیش بگرییّ، کەچی گەر تەنیابایە نەدەگریا؛ ئەمە مەرایی نییە، چونکە دیتنی گریانی خەڵکی دڵی مرۆ نەرم دەکاو کە خەڵکی خەمبار دەبینێ، خۆیشی خەم دایدەگرێ، ئەسرین دادەرژێنێ و بانگ هەڵدەدا.

رەنگە گریانەکەی بە بۆنەی دڵ نەرمیوە بێ، بەڵام بانگ هەڵدانی لە سۆنگەی مەراییوە بێ، بۆ ئەوەی سەرنجی پێبدەن. یان رەنگە لەبەر زۆری خەمی دڵی ببووریتەوەو خێرا هێزی هەستانەوە بە دەس بێنێتەوە، کەچی لەبەر ئەوەی نەڵێن خێرا هەستاوە و بوورانەوەکەی درۆ بوو، هەڵنەستێتەوە؛ لەم کاتەدا تووشیاری رووبینی هاتووە، هەرچەند لە بنەمادا مەرایی نەبووە.

یا رەنگە لە سەمادا بێ و هێزی رۆیشتنی هەبێ، کەچی بۆ ئەوەی نەڵێن تاسەکەی زۆری نەخایاندووە، پاڵ بداتە کەسێکیترەوە و بەکاوەخۆ بڕوا. هەروەها رەنگە داوای لێبوردن لە پەروەردگار کا و «استغفرالله» بڵێ، بە بۆنەی هەڵە و گوناح و کورتیەک کە هاتبێتەوە یادی لە کاتێکدا خەڵک لە عیبادەتدا دەبینێ؛ ئەمە رەوایە. یاخۆ رەنگە بە مەراییوە بیڵێ. دەبێ ئاگاداری ئەم بیرانەی بێ؛ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: «مەرایی حەفتا دەرکی هەیە». دەبێ هەر کات بیری مەرایی بە دڵیدا هات، بزانێ پەروەرندەی شارەزای پیسی دەروونیەو بەم کارەی دەکەوێتە بەر تووڕەیی و دوژمنایەتی پەروەردگار، بۆیە دەبێ خۆی لەم بیرە بپاریزێ و بێنێتەوە یادی کە پێغەمبەر فەرمووی: «نَعوذُ باللهِ مِن خُشوعِ النِّفاق[1]»؛ ئەمەش هەر ئەوەیە کە لەش خەریکی بەندەگی بێ و دڵ خەریکی سەرەتاتکێ.

**سەرنج:** هەرکاریّ بۆ پاداشی دوارۆژە دەبێ بێخەوشانە بۆ خودا بێ

---

١ ـ هانا دەبەمە بەر پەروەرندەم لە پەرستنی دوڕازانە.

بزانە هەرچی عیبادەتی وەکوو نوێژو ڕۆژووە، بێخەوشی تێیدایە پێویستە و مەرایی حەرامە. ئەو کارانەش کە ڕەوان و نیازی پاداشی لێیان هەیە، دەبێ بێخەوشانە بن. وەکوو ئەوەی کاروباری موسوڵمانان جێبەجێ دەکا بۆ پاداشی خوا، دەبێ مەبەستی خۆی دروست کاو هیچ چاوەڕوانی پێزانین و شوکرانەبژێریان لێ نەکا؛ هەروەها ئەو کەسەش کە زانست فێری خەڵکوخوا دەکا ئەگەر چاوەنوارِ بوو کە شاگردەکەی لە پاش ئەم بێ و خزمەتی کا، ویستوویە قەرەوی دەرس وتنەکەی بکرێ و هیچ پاداشی بەرناکەوێ. گەر تەمایەکی نەبوو، بەڵام شاگردەکەی خزمەتێکی کرد، چاتر وایە لێیێ وەرنەگرێ؛ گەر وەریگرت، چونکە مەبەستی پاداش نەبووە، ئەوەی لەڕواڵەتدا دیارە، دەقی پاداشەکەی بە خەسار ناڕوا. هەروەکوو ئەگەر پەرای نەکا، هیچ پێی گران نەبێ. پارێزگارانی دڵ پتەو لەمەش خۆیان بواردووە: بە چەشتێک کە دەڵێن یەکێکیان کەوتە نێو بیر. گوریسیان هێنا دەری بێنن. سوێندیانی دەداو دەیگوت هەرکەس حەدیسێکی لێ بیستووە، یان قورئانی بۆ خوێندووە، دەس لەو گوریسە نەدا تا پاداشەکەی بە خەسار نەڕوا.

یەکێک دیارییەکی بۆ سەفیانی سەوری هێنا، لێی وەرنەگرت. گوتی: «من چجار حەدیسم لێت نەبیستووە». گوتی: «براکەت لێمی بیستووە. دەترسم زۆرتر لە کەسانیتر خۆشم بوێ».

کابرایەک دوو کیسە زێڕی هێنایە لای سەفیان و گوتی: «خۆت دەزانێ، بابم برادەرت بووەو سامانی لە حەڵاڵ کۆوە کردووەو ئەمەش بە میرات بەرم کەوتووەو حەڵاڵە؛ لێم وەرگرە». لێی وەرگرت و ئەو کەسەش ڕۆیشت. سەفیان زێڕەکەی بە کوڕەکەی دا بۆی بباتەوە، چونکە هاتەوە یادی کە دۆستایەتی دەگەڵ بابی ئەو کەسە، لەبەر خودا بووە. کوڕەکەی سەفیان گوتی: «کە هاتمەوە، خۆم پێ نەگیراو گوتم: "مەگەر دڵت لە بەردە؟ خۆت دەزانی خێزانبارم و هیچم نییەو بەزەییت پێمدا نایەتەوە؟" بابم گوتی: "ڕۆڵە گیان! تۆ دەتەوێ خواردنی خۆش بخۆی و لە دواڕۆژدا لەسەر ئەوە لێم بپرسنەوە؟ من توانی ئەوەم نییە"».

هەروەها شاگردیش دەبێ تەنیا مەبەستی لە فێربوون ڕەزای پەروەرندەی بێ و چاوەڕوانی هیچ لە مامۆستای نەکا. ڕەنگە پێی وابێ چونکە عیبادەتی بە مامۆستای دەنوێنێ، دەبێ مامۆستای خێی زۆرتری بداتێ و ئەمەش هەڵەیە و هەمان مەراییە. بەڵکوو دەبێ بە پەرایی مامۆستای چاوەڕوانی ڕەزای خودای ماموستا بێ نەک خودی مامۆستا. هەروەها بۆ پەرایی دایک و بابیش دەبێ مەبەست ڕەزای پەروەردگار بێ، نەک ئەوەی خۆ وەکوو پارسا لە پێش چاوی دایک و بابی بنوێنێ تا لێیێ ڕەزابن، چونکە ئەمە گوناحێکی ئاشکرایە. بە کورتی لە هەر کارێکدا کە چاوەڕوانی پاداش بۆ دواڕۆژ هەیە، دەبێ ئەو کارە تەنیا بۆ خودا بێت و بەس.

## بنەمای نۆهەم - دەرمانی لووتبەرزی و خۆبەزلزانی

بزانە لووتبەرزی و خۆبەزلزانی، دانستەیەکی کرێتەو لە راستیدا دوژمنیە دەگەڵ خودا؛ چونکە گەورەیی تەنیا شیاوی ئەوە و بەس. لەم سۆنگەوە لە قورعاندا بە زۆری لۆمەی لووتبەرزان کراوە، هەروەک دەڵێ: كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ[1]؛ دیسان دەڵێ: وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ[2]. لە زمانی مووساوە دەڵێ: إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ[3].

پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی لە دڵدا بە قەدەر کلۆیەک یان خەردەلێک خۆبەزلدەزانێ، ناڕواتە نێو بەهەشتەوە». دیسان فەرمووی: «کەس هەیە پیشەی خۆبەزلزانی دەگرێتە بەر، تا ئەوەی ناوی لە ریزی ملهۆڕان دەنووسرێ و هەر بەسزای ئەوان دەچێ».

لە خەبەردا هاتووە کە سلەیمان گاسی دێو و درنج و فریشتە و مەل و مۆر و خەڵکوخوای کرد تا بێنەدەر: دوو سەد هەزار مەردم و دوو سەد هەزار فریشتە ئاپۆرەیان بەست بە دەوری وی؛ بە بای گوت هەڵیبگرێ و بیباتە ئاسمان بۆ لای فریشتەکان تا دەنگی زیکریان بژنەوێ؛ لە زەویدا رۆچوو تاگەیشتە ناخی دەریاکان؛ ئەوسا دەنگێ پێی گوت: «ئەگەر تۆزێ خۆبەزلزانی لە دڵی سلەیماندا هەبایە، بەر لەوەی بەرەو ئاسمانی تاوت دەم، لەزەویدا نوقمم دەکردی».

پێغەمبەر فەرمووی: «رۆژی پەسڵان خۆبەزلزانان لە بیچمی مێروولەدا رادەبن کە لەبەر سووکی و بێفەڕی کە لە لای پەروەردگار هەیانە، لەبەر پێێ خەڵکدا داکەوتوون». دیسان فەرمووی: «لە دۆژەهدا ئاقارێک هەیە پێی دەڵێن هەبهەب، شیاوە کە پەروەردگار خۆبەزلزانان و ملهۆڕان لەوێ

---

[1] ـ (قورئان، ٣٥/٤٠) خوا هەروا مۆر دەنێتە سەردڵی هەر خۆبەزلزانێکی زۆردار.

[2] ـ (قورئان، ١٥/١٤) هەرکەسێکش کە لاسار و ملهۆڕێک بوو، ناهۆمید بوو. (هـ).

[3] ـ (قورئان، ٢٧/٤٠) هانا دەبەمە بەر کەسێک -کە منیش و ئێوەشی پەروەراندووە- بمپارێزێ لە هەموو خۆبەزلزانێ کە باوەڕی بە رۆژی قیامەتێ نییە. (هـ).

بەرهەڵدا کا».

سەلمانی فارسی گوتی: «گوناحێ کە هیچ بەندەگییەک نایشواتەوە، لووتبەرزییە».

پێغەمبەر فەرمووی: «خوای دلۆڤان سەیری ئەو کەسە ناکا کە بە بۆنەی لووتبەرزی و ملهۆڕییەوە کراسەکەی لە دوایەوە بەسەر زەویدا دەکشێ». دیسان گوتی: «جارێک کابرایەک بە نازەوە دەڕۆیشت و بەرگێکی گرانی دەبەر کردبوو و سەیری خۆی دەکرد. خودا لەزەوینیدا رۆبرد و هەنووکەش دەڕوا تا رۆژی رابوون». دیسان فەرمووی: «ئەوەی خۆبەزل بزانێ و بە نازەوە بە رێدا بڕوا، رۆژی رابوون دەبینێ کە پەروەرێنەری بە تووڕەییەوە سەیری دەکا».

جارێک محەممەدی کوڕی واسیع کوڕەکەی بینی کە بە نازەوە دەڕۆیشت. گاسی کرد و گوتی: «هیچ دەزانی تۆ کێیت؟ دایکتم بە دووسەد درهەم کڕیوە و بابیشت پیاوێکە لە نێو موسوڵماناندا کە هەرچەند لەو کەمتر بێ، چاترە». موتەڕڕەف کوڕی عەبدوڵلا، مولەههەبی بینی کە بە نازەوە دەڕوا، گوتی: «هۆ بەنی! پەروەرێنەرت ئەم چەشنە رۆیشتنە بە دوژمن دەزانێ». گوتی: «هۆی! من ناناسی؟» گوتی: «دەتناسم، سەرەتا دلۆپە ئاوێکی گەن بووی، ئەنجامیشت مردارێکی بۆگەنی، لە ناونجی ئەو دوانەش کۆلکێشی پیساییەکان بووی».

## هێژایی خۆبەکەمزانی

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس خۆی بەکەم گرت، پەروەرندەی گەورەیی پێ بەخشی». دیسان فەرمووی: «هەموو کەسێ هەوسارێکی هەیە کە لە دەستی دوو فریشتەدایە: کە خۆ بە کەم بگرێ و سەری داخا، ئەوان هەوسارەکەی بەرز دەکەنەوە و دەڵێن: "پەروەرندەم! سەربەرزی کە!" گەر خۆی بەزلزانی، سەری رادەکێشن و دەڵێن: «پەروەرندەم! سەری نزم کە!"». دیسان فەرمووی: «خۆزگە بەوەی خۆ بە کەم دەگرێ، بەلام نە بە بۆنەی داماوییەوە؛ سامانێ کە بە گوناح کۆی نەکردۆتەوە بە خێر دەدا؛ بەزەیی بە هەژاراندا دێتەوە؛ دەگەڵ هۆزان و زانایاندا تێکەڵ دەبێ».

ئەبووسەلەمەی مەدەنی لە کالی خۆی دەگێڕێتەوە کە گوتی: «پێغەمبەر میوانمان بوو، بەرۆژوو بوو. بۆ بەربانگ کردنەوە، جامێک شیرم بۆی هێناو هەنگوینم تێکردبوو. لێی چەشت، شیرین بوو، فەرمووی: "ئەمە چییە؟" گوتمان: "هەنگوینمان تێکردووە". دایناو نەیخواردەوە فەرمووی: "ناڵێم حەرامە، بەلام هەرکەس لە بۆ خودا خۆی بەکەم بزانێ، پەروەرندەم هەڵیدەکشێ و گەورەیی دەداتێ؛ هەرکی لووت بەرز بێ، پەروەردگار لووتی دەشکێنێ و سووکی دەکا؛ هەرکەس لەجێێ خۆی خەرج کا، پەروەردگار بێنیازی دەکا؛ هەرکەس نابەجێ خەرج کا، پەروەرندەی پارسەکی[1] دەکا؛ هەرکەس

---

[1] ـ پارسەک: دەرۆزەکەر.

بە زۆری یادی خودا کا، پەروەرندەی بە دۆستی خۆی دەیزانێ"».

جارێک پارسەکێکی زامار لەبەر دەرگای پێغەمبەردا دەرۆزەیی دەکرد. پێغەمبەر خواردنی دەخوارد، بانگی کرد، هەموویان خۆیان کۆ کردەوە. پێغەمبەر لە تەنشتی خۆی دایناو بە خۆیەوە نووساندو گوتی: «بخۆ». یەکێک لە قورەیش بێزی لێهات و بە دزێوی سەیری کرد؛ کابرا نەمرد تا ئەو کاتەی بەو نەخۆشییە تووشیار بوو.

پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرێنەرم لە نێوان هەڵبژاردنی پێغەمبەرێکی بەنی و خۆنکارێکی پێغەمبەردا سەربەخۆی هێشتم. نەختێ رامام، برادەرم لە نێوان فریشتەکان جوبرەئیل بوو، سەیرم کرد، گوتی لە هەمبەر پەروەرندەت خۆبەکەم بگرە. گوتم: "دەمەوێ بەندە بم و پێغەمبەر"».

پەروەردگار وەحی ناردە سەر مووسا و گوتی: «من نوێژی کەسێک دەپەزێرم کە لە ئاست خەڵکدا لووتبەرز نەبێ و خۆبەکەم بگرێ، دڵی لە ترسی خودا تەژی کا و هەموو رۆژێ لە یادی من بێ و لەبەر من واز لە ئارەزووەکانی بێنێ».

پێغەمبەر فەرمووی: «دڵفراوانی لە پارێزگارییە، شەرەف لە خۆبەکەم زانییەو دەوڵەمەندی لە دڵ قایمیە».

عیسا گوتی: خوزگە بە خۆ بە کەم زانان، چونکە لە دوارۆژدا ئەمانەن خودانی مینبەرەکان؛ خوزگە بەوانەی لە دونیادا خەڵک پێکەوە ئاشت دەدەنەوە، بەهەشت جێگایانە؛ خۆزگە بەوانەی دڵیان لە خۆشەویستی دونیا پاکژە، چونکە پاداشیان دیداری خودایە».

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس خودا رێ ئیسلامی پێنواند، روومەتی بەدەوی بۆ ئافراند، بارودۆخی وانەبوو بێزت لێ بێ و دەگەڵ ئەمانەش خۆبەکەمزانی پێبەخشیبوو، ئەوە لە بژاردەکانی لای پەروەرندەمە».

کابرایەک ئاوڵەی گرتبوو؛ تاقمێ خواردنیان دەخوارد، لە لای هەرکەسەی رۆدەنیشت ئەو کەسە جێگای دەگۆڕییەوە. پێغەمبەر کابرای بانگ کردە لای خۆی و فەرمووی: «زۆرم خۆش دەوێ ئەو کەسەی کەڵ و پەلی بگرێتە دەست و بیباتەوە بۆ ماڵ. توێشوویەک بۆ بنەماڵەکەی بباتەوە، تا بەڵکوو لەم سۆنگەوە خۆبەزلزانیەکەی نەمێنێ». بە یارانی گوت: «بۆچی شرینی عیبادەتتان تێدا نابینم؟» گوتیان: «شیرینی پەرستن چییە؟» فەرمووی: «خۆبەکەمزانی». فەرمووی: «هەرگا خۆبەکەمزانێکتان بینی، خۆبەکەم بگرن و هەر کات خۆبەزلزانێکتان بینی، ئێوەش لووت بەرز بن، تا پەستی و بچووکی خۆیان ببینن».

**ئاسار**

عایشە دەڵێ: «ئەنگۆ لە هێژاترین عیبادەت بێ ئاگان، ئەمەش خۆبەکەمزانینە». فوزەیل دەڵێ:

«خۆکەمگری ئەوەیە کە پەیڤی راست لە هەرکەس بێ، دانیپێدا بنی، هەرچەند ئەو کەسە منداڵێ بێ یا خۆ نەزانترینی خەڵکیش بێ». ئیبنولموبارەک دەڵێ: «خۆکەمگری ئەوەیە هەرکەس سامانی لە تۆ کەمترە، خۆت لێی خوارتر بگری تا پێیْ بنوێنی کە بە بۆنەی سامانتەوە خۆت بە گەورەتر نازانی و هەرکەس سامانی لە تۆ فرەترە، خۆت لێی سەرتر بگری تا بزانێ سامانی لە لای تۆ هیچ نرخی نییە».

پەروەردگار بە عیسای گوت: «کاتێ نیعمەتێکت دەدەمێ، خۆبەکەمگرانە وەریگرە تا سەرلەبەری ئەو خێرەت پێ بدەم».

ئیبنیسەمماک هەموو رۆژێ بە هارونەرەشیدی دەگوت: «ئەی ئەمیر! خۆکەمگری لە گەورەییدا، هێژاترە لە شەرەفت». ئەویش دەیگوت: «زۆر جوانت گوت». پاشان دەیگوت: «گەورەم! هەرکەس خودا سامان و گەورەیی و جوانی پێ بدا و لە ساماندا باربوو بدا و لە گەورەییدا خۆبەکەم بگرێ و لە جوانیدا پارسا بێ، لە نووسینگەی پەروەردگاردا ناوی لە ریزی دلبێشان دەنووسرێ». هارون داوای کاغەز و قەڵەمی کرد و ئەم پەیڤەی نووسی. سلەیمان لە ولاتی خۆیدا، بەیانیان لە دەوڵەمەندانی دەپرسی و پاشان لە لای هەژاران دادەنیشت و دەیگوت: «من هەژارێکم و ئەنگوش چەند هەژارن».

چەن کەس لە گەورەکان لەسەر خۆبەکەمگری ئاخاوتوون: حەسەنی بەسری گوتی: «خۆبەکەمگری ئەوەیە، کاتێ لە ماڵ هاتیە دەر، هەرکەست بینی لە خۆت هێژاتری بزانی». مالکی دینار گوتی: «گەر لەبەر دەرگای مزگەوت هاوار کەن و بڵێن خراپترین کەس بێتە دەر، کەس ناکەوێتە پێشم، مەگین بە رکەبەرێ». ئیبنولمبارەک ئەمەی ژنەفت و گوتی: «هۆی گەورەیی مالک، ئەمەیە».

یەکێک هاتە لای شبلی. شبلی پرسی: «تۆ کێی؟» گوتی: «من ئەو نوختەم کە لە ژێر بێدا دایدەنێن؛ واتە لەوە خوارتر هیچ هەر نییە». گوتی: «خودا تۆ لەسەر رێگات هەڵبگرێ؛ چونکە خۆتت لە خوارترین شوێن رانا». یەکێک لە گەورەکان لە خەودا عەلی بینی، گوتی: «مۆچیاریم کە». گوتی: «چەن جوانە خۆکەمگری دەوڵەمەندان لە لای هەژاران بۆ بە دەستهێنانی پاداشی دوارۆژ؛ هەروەها جوانتر لەوە لووتبەرزی هەژارانە لە بەرانبەر دەوڵەمەندان بە بۆنەی متمانە بە سەرتری پەروەردگار».

یەحیا کوڕی خالید دەڵێ: «مێرخاس کە ببێتە پارسا، خۆبەکەم دەگرێ و نەفام کە بوو بە پارسا خۆبەزل دەگرێ». بایەزیدی بەستامی دەڵێ: «مرۆڤ تا ئەو کاتەی تەنیا یەک کەس لە خەڵکوخوا خوارتر و خراپتر لە خۆی دەزانێ، لووتبەرزە». جارێک جونەید لە نوێژی هەینیدا گوتی: «گەر وانەبایە کە لە خەبەردا هاتووە کە رۆژی پەسڵان هێژاترینی هەر هۆزێک سووکترینیانە، قەد ئەم کۆڕەم بە رەوا نەدەزانی». جونەید دەڵێ: «خۆکەمگری لە نێو تاکپەرستاندا، خۆبەزلزانیە؛ واتە

خۆبەکەمگری ئەوەیە کە خۆت بێنیە خوارێ، جا کە نیاز بوو خۆت بێنیە خوارێ، بێ گومان خۆت لە شوێنێکی بەرز داناوە کە دێیتە خوارێ». عەتای سولەمی هەرکات هەورو تریشقە بایە، رادەبوو و وەکی ژنی زگ پڕ دەستی بەزگیدا دەکێشا و دەیگوت: «ئاخ! ئەمە هەمووی لە بەدفەڕی منە تووشی خەڵک بووە». تاقمێ لە لای سەلمان شانازییان بەخۆوە دەکرد، ئەویش گوتی: «سەرەتام تراوێکە و ئەنجامم مردوویەک، پاشان بە سەنگ و ترازوو چاک و خراپ خویان دەبێ و کەس لە ناکەس هەڵداوێرن».

## شرۆڤەی راستەقینەی خۆبەزلزانی و زیانەکانی

بزانە لووت بەرزی ئاکارە و ئاکاریش هی دڵە، بەڵام شۆپی لە رواڵەتدا ئاشکرایە. لووت بەرزی ئەوەیە کە خۆی لە خەڵکی سەرتر و باشتر بزانێ و لەم سۆنگەوە هەست بە شادی کا؛ ئەو بایە کە لە ناخیدا هاتۆتە دی، لووتبەرزی پێ دەبێژرێ. پێغەمبەر فەرمووی: «اَعُوذبِکَ مِن نَفخَةِ الکِبر»؛ واتە: پەنات پێ دەبەم لە بای لووتبەرزی. کە ئەم بایەی لە دڵدا هاتەدی، خەڵکی بە خوارتر لە خۆ دەزانێ و بە چاوی بەنی سەیریان دەکا و تەنانەت رەنگە بەشیاوی خزمەتکاری خۆی نایانزانێ و دەڵێ: «تۆ کێی کەشیاوی پەرای من بی؟» ئەمەش ئەو پەڕی خۆبەزلزانیە و لەگەورەیی پەروەردگاریش بازی داوە؛ چونکە پەروەردگار بەندەگی و کڕنۆشی هەمووان دەپەزێرێ. ئەگەر نەگەیشتبێتە ئەم رادە، لە رۆیشتن و دانشتندا خۆی دەخاتە پێشەوە؛ چاوەڕوانی رێز و حورمەت دەکا و وای لێ دێ کە گەر مۆچیاری کەن نایسەلمێنێ و کە خۆی پەند بە کەسێک بدا، بە زۆر پیێ دەڵێ و گەر شتێکی پێ فێرکەن تووڕە دەبێ و واسەیری خەڵکوخوا دەکا، وەکی ئەوەی سەیری ئاژەڵ دەکا.

لە پێغەمبەریان پرسی: «لووتبەرزی چییە؟» فەرمووی: «ئەوەیە کە سەر بۆ راستەقینە نەوی نەکاو بە چاوی سووک سەیری خەڵکی کا». ئەم دوو دانستە، پەردەیەکی زۆرگەورەن لە نێوان مرۆڤ و پەروەرێنەری؛ هەر لەمە ئاکاری دزێو دەبێتەوە و لە هەموو ئاکارێکی جوان بێ بەش دەبێ: چونکە هەرکەس گەورەیی و خۆویستی و خۆبەزلزانی و لووتبەرزی بە سەریدا زاڵ بوو، ئەوەی بۆ خۆی بیەوێ، بۆ خەڵکوخوا نایەوێ، ئەمەش مەرجی بڕواداری نییە؛ دەگەڵ کەس خۆی خوارناگرێ و ئەمەش دانستەی پارێزکاران نییە؛ ناتوانێ واز لە رژدی و چنۆکی بێنێ و دڵ لە زەغەڵ و دەغەڵ پاکژ کاتەوە و تووڕەیی خۆی بخواتەوەو زاری لە خوسپە بپارێزێ، چونکی هەرکەس رێزی نەگرێ، رقی لێ هەڵدەگرێ؛ لانی کەمی ئەوەیە هەموو رۆژێ بە خۆیدا هەڵدەڵێ و خۆی لە بەرزی رادەنێ و لە فێڵ و گزی و درۆ و دوڕوویی بێوەر نییە، بۆ ئەوەی کردەکانی خۆی لە لای خەڵکی بەرز پیشان بدا. راستیەکەی ئەوەیە کەس بۆنی بەهەشت ناگاتە بینی، مەگین ئەوەی خۆی لە بیر باتەوەو تەنانەت هیچ خۆشییەکی دونیا قبووڵ نەکا. یەکێک لە گەورەکان گوتی: «گەر دەتانەوێ بۆنی بەهەشت

ببیسن، خۆتان لە نووکوبەدی خەڵکوخوا خوارتر بگرن».

گەر کەسێک ئیزنی پێ بدرێ تا دەروونی ئەو دوو لووت بەرزەی کە پێک دەگەن ببینێ، لە هیچ زبڵدانێ ئەو پیساییەی کە لە دڵی ئەو دوو زەلامەدایە نابینرێ: دەروونیان وەکی سەگی لێ هاتووە، کەچی وەک ژنان خۆیان دەڕازێننەوە و ئەو هۆگرییەی کە موسوڵمانان لە پێوەندی دەگەڵ یەکتر هەیانە، ئەوان چجار هەستی پێ ناکەن. ئەو کاتە لە دیتنی کەسێک دەحەسیتەوە کە بە دڵ و گیان دەگەڵی بی، ئەوەندەی خزمەتکەی تا دوو نەمێنێ و ببنە یەک، تۆ بە خزمەتی ئەو و ئەۆ بە خزمەتکردنی تۆ لە نێو یەکدا بتوێنەوە و ببنە یەک و دوو هەر نەمێنێ، یان ئەوەی کە هەردووتان لە خوادا بتوێنەوە و دەگەڵ خودا ببنە یەک. لەم یەکەتییەدا تەواوتربوون مسۆگەرە. بە کورتی، تا دوو هەبێ، حەسانەوە و ئاسوودەگی نایەتە دی، چونکی حەسانەوە لەیەکەتیدایە. ئەمەیە راستەقینەی لووتبەرزی و خۆبەزلزانی و زیانەکانی.

## شرۆڤەی رادەکانی خۆبەزلزانی

بزانە، هەندێ لووتبەرزی نەگونجاوتر و گەورەترن، هۆی ئەم جیاوازییەش ئەوەیە کە خۆبەزلزانی سێ جۆرە: یان خۆیان لە خوا گەورەتر دەزانن، یان لە پێغەمبەر، یان لە بەندەکانی خوا.

**یەکەم** - خۆ لە خوا گەورەتر زانین، وەکوو نمروود و فیرعەون و شەیتان و ئەوانەی دەیانگوت ئێمە خوداین و لە بەندەیی پەروەردگار شەرمیان دەهات و خوداش گوتی: لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ[1] واتە: نە عیسا لە بەندەگی خودا شەرمی کردووەو نە فریشتەکانی دەرگای.

**دووەم** - خۆ لە پێغەمبەر بە گەورەتر زانین، وەکوو کافرەکانی قورەیش کە دەیانگوت: **«ئێمە لە هەمبەر مرۆڤێکی وەکی خۆمان سەرنەوی ناکەین، بۆچی فریشتەیەکی بۆمان نەنارد؟ یاخۆ بۆچی** گەورە پیاوێکی نەنارد؟ سێویەکی بۆمان ناردووە، وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ[2]». ئەمانە دوو دەستە بوون: تاقمێ لووتبەرزی تەگەرەی تێخستبوون تا رانەمێنن و تێنەفکرن و پێغەمبەری محەممەد نەناسن: هەروەک گوتی: سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَـٰتِىَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ

---

١ ـ قورئان، ٤/١٧٢.

٢ ـ (قورئان، ٤٣/٣١) بۆ ئەم قورئانە بۆ پیاوێکی بەوەجی ئەم دوو باژێرە نەهاتەخوار. (هـ).

بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ[1] واتە ڕێ نادەم کە لووتبەرز و خۆبەزلزانان نیشانەکانی پەروەرندەیان ببینن. تاقمێ‌تر دەیانزانی، بەڵام لەبەر لووتبەرزیان نەیاندەوێرا دانی پێدا بنێن؛ هەروەک دەڵێ: وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗا[2].

**سێهەم** - ئەوەیە کە خۆ لە بەندەکانی خوا بە گەورەتر دەزانێ و بە چاوی سووک پێیاندا دەنوارێ و گوتەی راستیان ناپەزێرێ و خۆی بە چاکتر و گەورەتر دەزانێ. ئەمە هەرچەند کەمتر لەوانی‌ترە، بەڵام لە سۆنگەی دوو هۆکارە گرینگ و گەورەیە:

**یەکەم** ئەوەیەکە گەورەیی دانستەی پەروەردگارە و بەندەی بێ‌هێز و لارەمل کە هیچ کارێکی بە دەستی خۆی جێ‌بەجێ نابێ، چۆن خۆی بەگەورە دەزانێ و ئەم گەورەییەی لە کوێرا هێناویە کە شان لە شانی گەورەیی خودا دەدا؟ ئەمە وەکی ئەو کۆیلەیە کە کڵاوی پادشا لە سەردەکا و لەسەر تەختی پادشایی رۆدەنیشێ. جا بزانە چلۆن شیاوی ئازار و سزاو تووڕە بوونە؛ بۆیە پەروەردگار فەرمووی: «اَلعَظَمَةُ اِزاری وَالکِبریاءُ ردائی فَمَن نازَعَنی فیهما قَصَمْتُهُ»؛ واتە: گەورەیی و بەرزی تایبەت بە منەو هەرکەس لەمەدا دەرۆستم بێ، دەیفەوتێنم. کەواتە چونکە بێجگە لە خوا کەس بۆی نییە خۆی لە بەندەکانی بە گەورەتر بزانێ، خۆبەزلزانی شەڕوکێشەیە دەگەڵ پەروەردگار؛ وەکوو کەسێک لە خوڵامەکانی پادشا بخوازێ خزمەتێکی کەن کە ئەو خزمەتە تەنیا شیاوی پادشا بێ و بەس.

**هۆیەکی‌تر** ئەوەیە ئەم لووتبەرزییە دەبێتە بەربەست لە هەمبەر سەلماندنی راستی لە خەڵکی؛ ئەوانەی کە لووتبەرز بن، لە پرسەکانی دیندا پێکرا شەڕەقسە دەکەن و کە یەکێکیان قسەی راستی کرد، ئەویتر لێی وەرناگرێ و دانی پێدا نانێ. ئەمە ئاکاری دوڕووان و کافرانە؛ هەروەک پەروەردگار لەمەڕ کافران گوتی: وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَغۡلِبُونَ[3]؛ دیسان گوتی: وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ[4]؛ واتە: کە پێی دەڵێن لە خوا بترسە، دەمارزلی پتر بەرەو گوناحی دەبا. جارێک پێغەمبەر بە یەکێکی گوت: «بە دەستی راست نان بخۆ». گوتی: «ناتوانم». گوتی «ناتوانی» -چونکە زانی بە دەمارزلییەوە وای گوت- دەستی کوچ بوو و نەجوولایەوە.

---

١ ـ قورئان، ٧/١٤٦.

٢ ـ (قورئان، ٢٧/١٤) هەر چەند لە دڵی خۆیاندا هەموویان بە راست دەزانی، خۆ بە زلزانی و ناهەقی بوونە هۆی حاشا کردنیان. (هـ).

٣ ـ (قورئان، ٤١/٢٦) خودانەناسەکان گوتیان: گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن؛ قسەی بێتامی خۆتانی تێکەڵ بکەن؛ بەشکوو بە سەریا سەرکەون. (هـ).

٤ - قورئان، ٢/٢٠٦.

بزانە سەربهوردی شەیتانیان لەبەر ئەوەی کە دیرۆکە بۆت نەگێڕایەوە، بەڵکوو گوتیان تا بزانی زیانی خۆبەزلزانی بەرەو کوێت دەبا. چونکە شەیتان لە سۆنگەی لووتبەرزیەوە بوو کە گوتی: أَنَاْ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ[1]. خۆبەزلزانی وای لێکرد کە پەیڤی خودای نەسەلماندو کڕنۆشی نەبرد و کەوتە بەر لەحنەت.

**شرۆڤەی هۆکارەکانی دەمارزلی و دەرمانەکانی**

بزانە ئەوەی کە خۆی بەزل دەزانێ، لە سۆنگەی دانستەیەکە کە پێی وایە هەیەتی و خەڵکیتر نییانە، ئەو دانستە بە هۆی تەواوتربوونی خۆی دەزانێ و ئەو هۆوانەش حەوتن:

**هۆکانی خۆ بە زلزانی**

**هۆی یەکەم،** لووتبەرزی بە هۆی زانستە؛ چونکە زانا خۆی بە زانست تەیار کردووە، کەسانیتر لە ئاست خۆیدا وەکی چوارپێ دەزانێ و لووتبەرزی و دەمارزلی بە سەریدا زاڵ دەبێ و چاوەنوارە خەڵکی ئاگایان لێ بێ و پەرای کەن و دیاری پێ بدەن؛ زۆری پێ سەیرە کە وانەکەن. کە سەیری خەڵک دەکا یان لە گەڵیان قسە دەکا یان بۆ سەردانیان دەڕوا، پێی وایە منەتی زۆری ناوەتە سەریان و خەڵک بە منەتباری زانستی خۆی دەزانێ. لە باسی دواڕۆژدا خۆی ناخاتە ریزی ئەوان و پتر هیوای بە رزگاری خۆی هەیە و لە دواڕۆژی خەڵک دڕدۆنگە و دەڵێی هەموو خەڵکی نیازمەندی دوعای بەخێری خۆی دەزانێ و دەڵێ بە هۆی منەوە لە دۆژەەدەرباز دەبن؛ بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «آفَةُ العِلمِ الخُيَلاءُ؛ زیانی زانست خۆبەزلزانییە».

بە راستی کە ئاوەها کەسێک زۆرتر شیاوە پێی بڵێن نەزان، تا زانا؛ چونکە زانستی بەڕاستی ئەوەیە کە مەترسی دواڕۆژی بۆ خویان کاو رێگای سیراتی پێ پیشان بدا. کەسێک لەمە تێگەیشت، هەردەم خۆی لە دەربازبوون دوور دەبینێ و خۆی بە تاوانبار دەزانێ.

لە بەرترسی دواڕۆژ و مەترسی ئەوەیی کە زانست دوایین بەڵگە و رێنومای بووە، دەمارزل نەبێ. هەروەک ئەبوودەردا گوتی: «هەر زانستێ کە زیاد دەبێ، دەردێ دێتە سەر دەردەکانیتر». بەڵام ئەوانەی کە زانست فێر دەبن و لووتبەرزیان پتر دەبێ، دوو هۆیان هەیە:

یەکەم ئەوەیە کە زانستی راستەقینە کە زانستی دینە، فێر نەکراون؛ بە هۆی ئەم زانستەیە کە خۆیان دەناسن و ملەکانی رێگەی دین و مەترسی دواڕۆژ و پەردەی نێوان خۆیان و خودا دەزانن.

---

١ ـ قورئان (٧٦/٣٨) من چاتر لەوم؛ منت لە ئاور ئافراندووە و ئەو لە قوڕ.

ئەم زانستە دەرد و خۆبەکەمگری زۆر دەکا، نەک دەمارزلی. بەلام فێربوونی زانستی پزیشکی و ژمێریاری و ئەستێرەناسی و زمانەوانی و جەدەل و خەلاف، بێجگە لووتبەرزی چیدی فێر ناکا.

نزیک بەم زانستە، زانستی فتوایە، ئەوەش زانستی ڕێکوپێککردنی خەلکی دونیایە؛ کەواتە لە زانستی دونیایە. هەرچەند ئەوەش بۆ کاری دین زۆر پێویستە، بەلام گەر بێجگە لەوە زانستیتر فێر نەبێ، هیچ ترس ناخاتە دڵ، دڵ تووشی تاریکی و لووتبەرزی و دەمارزلی دێ. ژنەوتن کەی دەبێتە وەک دیتن، سەیری ئەم هۆزە کە و بزانە چۆنن. ئەمانەش وەکی تامات و وشە رازاندنەوەو پەیڤی جوان کە دەبنە هۆی بوورانەوەو نەعرەتەی خۆیان، هیچ بەهرەیکیتر بە خەلکی نادەن و نە لە راستەڕێ شارەزایان دەکەن و نە رژدی و چنۆکی و مەرایی و دەردیتر دەرمان دەکەن و تەنانەت تووی ئەم دەردانەش دەپژێننە دڵ و دەبنە هۆی خۆبەزلزانی.

ئەویتر ئەوەیە کە هەرچەن ئەو کەسە زانستی بە کەلکی وەکوو راڤەی قورئان و ئەخبار و سەربهوردی پێشوونان و بابەتی لەم چەشنە -کە لەم کتێبە و لە ئەحیادا هێناومانە- فێر بێ، کەچی دیسان تووشی لووتبەرزی بێ. هۆکەی ئەوەیە کە لە راستیدا دەروونی پیس و پوخلە و ئاکار نزمە. مەبەستی لە خوێندن و گوتنی ئەم زانستە، تەنیا فێربوونە نەک پارێزکردن لە هەلە و گوناح؛ کە زانست گەیشتە دەروون، رەنگوبۆی دەروون دەگرێتە خۆ، وەکوو دەرمان کاتێ دەگاتە گەدە، بەر لەوەی کاریگەربێ، دەگۆڕێ و وەکی دەردەکەی لێ دێ. وەک ئاوی پاکژو پاراو کە لە ئاسمان دادەبارێ و دەگاتە بنجی هەر روەکێ دانستەی ئەو روەکە دەگرێتە خۆ و گەر تاڵ بێ، تالتر دەبێ و گەر شیرین بێ، شرینتر دەبێ.

ئیبنیعەبباس دەگێڕێتەوەو دەلێ کە پێغەمبەر فەرمووی: «تاقمێ هەن قورئان دەخوێنن، بەلام لە گەروویان بەولاوە ناڕوا، کەچی دەلێن: "کێ وەکوو ئێمە قورئان دەخوێنێ و وەکی ئێمە لێی دەزانێ"». پاشان سەیری یارانی کرد و گوتی: «ئەوانە لە ئێوەن. ئۆمەتی من! ئەوانە هێزمی ئاوری دۆزەهن».

عومەر گوتی: «لە زانایانی لاسار مەبن، چونکە ئەو دەم زانستەکەتان هیچ بەزەیی بە نەزانیتاندا نایە». پەروەردگار بە پێغەمبەری فەرموو، خۆبەکەم بگرە و گوتی: وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ[1] لەم سۆنگەوە بوو یارانی پێغەمبەر زۆر دەترسان لەوەی تووشی دەمارزلی بن.

جارێک حوزەیفە بوو بە ئیمام، پاشان گوتی: «بەرنوێژێکیتر بێنن، وام بە دلدا هات من لە ئەنگۆ چاترم». جا کە ئەمان لە بیری خۆبەزلزانی دەترسان، کەسانیتر چۆن تووش نەبن؟ لەم رۆژگارەدا لە

---

١ ـ (قورئان، ٢١٥/٢٦) بالت شۆڕ کە بۆ ئەوبڕوادارانەی شۆنت کەوتوون. (هـ)

کوێ ئاوەها زانایەک دەس دەکەوێ؛ زۆر دەگمەنە زانایەک کە بزانێ ئەم دانستە کرێتە و خۆی لێ بپارێزێ. زۆربەیان گوێچکەی خۆیان لێئاخنیوەو شانازی بە لووتبەرزی خۆیان دەکەن و دەڵێن: ئێمە فلان‌کەس بە کەس نازانین و بایەخی پێ نادەین و چجار سەیری ناکەین و لەم پەیڤانە. کەواتە هەرکەس ئەم زانستەی پێ بێ، زۆر هێژایەو دیتنی عیبادەتە و دەبێ هەمووان خۆیان پێ مفەرِک کەن، گەر واش‌نەبوو، چونکە لە خەبەردا هاتووە: «رۆژگارێ دێ هەرکەس دەیەکی عیبادەتی ئێوە بکا، دەرباز دەبی» ترسی ناهۆمێدی هەیە؛ بەڵام لەم رۆژگارەدا کەمیش هەر زۆرە، چونکە یار و یاوەری دین نەماوە و راستییەکانی دین پەرپووت بووگن؛ هەرکی رێ دەبرِێ، زۆرتر دەبێ بە تەنیا بروا و یاری نەبێ و رەنج و ئازاری چەن بەرانبەر بێ؛ کەواتە، دەبێ هەر بەمە قنیات بکرێ؛ ان‌شاالله تعالی.

**دووەم،** لووتبەرزی لە پارێزگاری و عیبادەتدا؛ پارێزگار و سۆفی و عابد و پارسا لە خۆبەزلزانی دوور نین، بە چەشنێ کە خەڵک بە ناچار دەزانن سلاویان لێ بکەن و دەستیان راموسن و دەڵێی منەتی عابدبوونی خۆیان بەسەر خەڵک‌وخوادا دەنێن. رەنگە وا بیر کەنەوە کە خەڵکی تەفروتوونا دەبن و تەنیا ئەوان لە پردی سیراتدا بە سەلامەت دەپەرِنەوە.

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس بڵێ خەڵکی فەوتان، خۆی فەوتاوە، چونکە بە سووکی بە خەڵکدا روانیوە». دیسان فەرمووی: «گوناحێکی گەورەی تووش بووە ئەوەی بە سووکی سەیری برای موسوڵمانی کا». مەودای نێوانی ئەم کەسە و ئەوەی بە مفەرِکی دەزانێ و بە چاتر لە خۆی دەیزانێ و لەبەر خودا خۆشی دەوێ، گەلێک زۆرە. دەبێ بترسن لەوەی کە پەروەردگار پاگەی ئەوان بداتە ئەم خەڵکەو بۆ خۆیشی لە بەزەیی و بەرەکەتی خودا بێوەری بێ. دەڵێن لە نێو بەنی‌ئیسراییلدا کابرایەک بوو زۆر پارێزگار بوو، کابرایەکیش هەتا بڵێی خراپکار بوو. پیاوی پارێزکار دانیشتبوو و لەتە هەورێ لەسەر سەری راوەستابوو و سێبەرێکی بۆ خۆش کردبوو. خراپکار گوتی: «بابرِۆم و لە لای ئەم پیاوە دانیشم، بەشکوو پەروەرندەم بە بۆنەی ئەوەوە لێم ببورێ و لە هەڵەکانم چاو بپۆشێ». کە لە لای دانشت، پارێزگار لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمە کەی بۆی هەیە لە لای من دابنیشێ، لە من چاکەکارتر و لەو خراپکارتر لەم هۆزە نییە». گوتی: «هەستە و لێم دوور بە ئەی خراپکار!» هەستا و رۆیشت و هەورەکەش لەگەڵی رۆیشت. وەحی هاتە سەر پێغەمبەر سەردەم و گوتی پێیان بڵێ «هەر دووکتان لە نوێوە عیبادەتتان لەسەر بگرنەوە؛ چونکە هەرچی خراپکار کردبووی لە سۆنگەی ئەو باوەرِە جوانەوە لەنێو دەفتەری کردەوەکانی سریمەوە و هەرچی پارێزکار کردبووی بە بۆنەی ئەو لووت- بەرزیەوە پووچەڵ کرایەوە».

کابرایەک پای نابووە سەر گەردنی پارێزگارێک. پارێزگار گوتی: «پێت هەڵبگرە، سوێند بە خودا کە

پەروەرندەم بەزەیی پێتدا نایەتەوە». وەحی هات کە پێی بڵێن: «ئەی ئەو کەسەی کە سوێند دەخۆی نایبوورم، خوت نابوورم». زۆرتر وایە کە پارێزگار هەست دەکا ئەوەی ئازارێکی پێ دەگەینێ، پەروەردگار لێی نابووریٚ و بەزەیی پێیدا نایێتەوە. هەروەها رەنگە بڵێ: «زۆر ناخایەنێ خودا سزای ئەو گوناحەی بداتەوە». کە زیانێک بەو کەسە گەیشت، دەڵێ: «تێگەیشتی چی بەسەر هات». واتە ئەمە لە گەورەیی منە. ئەم نەفامە نازانێ کە زۆر لە کافرەکان پێغەمبەریان ئازار دەداو خودا هیچ تۆڵەی لێ نەکردنەوەو هەندێکیشی کردە موسوڵمان، پێی وایە ئەم هێژاترە لە پێغەمبەر کە تۆڵەی ئەم دەسێنێتەوە. پارێزکارانی هیچ نەزان وەهان. کەچی پارێزکارانی ژیر و خاوەن بیر وا بیر دەکەنەوە کە هەرچی بەلا و مێمڵ تووشی خەڵک دێ، لە بەدفەڕی و قۆشەیی ئەمانە. عومەر کە لەو پەڕی دلبێشی و پاکیدا بوو لە حوزەیفەی دەپرسی: «هیچ دیاردەی دوڕازیم تێدا دەبینی؟» کەواتە باوەڕدار خۆ لە هەرچی گوناحە دەپارێزێ و کەچی دیسان هەر دەترسێ؛ بەلام پارێزگاری نەفام بە رواڵەت بەندەگی دەکا و دەروونی بۆتە کانگای هەرچی پیسی و لووتبەرزیە و چجار ترس بە دڵیدا نایە. بە راستی هەرکی ئارخەیان بوو کە لە خەڵکی هێژاترە لە لای خودا، بەم نەزانییەی هەرچی عیبادەتیە بە خەسار داوە، چونکی هیچ گوناحێ گەورەتر لە نەزانی نییە.

رۆژێک یارانی پێغەمبەر پەسن و تاریفی کابرایەکیان دەکرد. لەپڕ کابرا لەوێ رابورد، گوتیان: «ئەی پێغەمبەر! ئەو مێرخاسەی کە گوتمان ئەمەیە». پێغەمبەر فەرمووی: «نیشانەی دوڕازی تێدا دەبینم». هەموو پێیان سەیر بوو. کە گەیشتە لای پێغەمبەر، لێی پرسی: «سوێندت دەدەم بە پەروەرێنەرم کە راستم پێ بڵێ، بەبیرتدا تێپەڕاوە کە لەم هۆزەدا کەس لە تۆ باشتر نییە؟» گوتی: «تێپەڕاوە». فەرمووی: «ئەم پیساییەی دەروونیم لەسەر روومەتیدا بە هۆی رووناکی پێغەمبەریوە دی و ئەمە پێی دەڵێن دوڕازی». ئەمە بۆ زاناو پارێزگاران زیانێکی ئێجگار گەورەیە و ئەمانەش لەم چەمکەدا دەبنە سێ چین:

**چینی یەکەم**، ئەوەیە کە ناتوانێ دڵ لەم بیرە بسڕێتەوە، بەلام بە کۆشەوە خۆیبەکەمدەگرێ، واتە وەکوو ئەو کەسانەی دەبزوێتەوە کە خەڵکی لە خۆیان سەرتر دەزانن. بە چەشنێ کە چجار لە دەست و زار و هەڵسوکەوتیان دیار نییە. ئەم پیاوە نەیتوانی داری خۆبەزلزانی و لووتبەرزی لە ناخی خۆیدا وشک کا، کەچی هەموو لق و پۆپ و گەڵا و چڵی ئەو دارەی بڕیوەتەوە.

**چینی دووەم**- ئەوەیە کە ئاگاداری زمانیە و نایدرکێنێ و لە هەموو شوێن دەڵێ: «من خوارتر لە هەموو کەسم». بەلام لە کردەوە و هەڵسوکەوتیدا کاری وای لێ دەوەشێتەوە کە لووتبەرزی لێ دیارە: وەکوو ئەوەی لە هەر کوێ بێ لە لای سەروو دادەنیشێ، لە پێش هەمووانەوە دەڕوا، گەر زانا بێ بەر دەکاتە لایەکەوە وەکوو بلێی شەرم لە خەڵکوخوا دەکا، گەریش پارێزکار بێ رووی خۆی

گرژ دەکا وەکوو بڵێی لە خەڵک توورەیە. ئەم دوو نەزانە نازانن زانیاری و پارێزکاری لە رووگرژکردن و سەرهەڵگەڕاندنەوەدا نییە؛ بەڵکوو لە دڵایە و لە رواڵەتدا شۆپی بە خۆبەکەمگری و دڵۆڤانی و بەزەیی ئاشکرا دەبێ؛ هەروەک پێغەمبەر کە زاناترین و پارێزکارترین کەس بوو، کەچی کەس لەو خۆبەکەمگرتر و دڵۆڤانتر و رووگەشتر نەبوو؛ بەبێبزە و پێکەنین سەیری کەسی نەدەکرد، کەچی خودا پێی دەگوت: وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ هەروەها فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ[1] واتە: لە بەزەیی خودادایە کە تۆ هێندە نەرمونیانی دەگەڵیان، تا بڵاوەت لێ نەکەن.

**چینی سێیەم**- ئەوەی کە هەم بە زار شانازی بەخۆ کاو فیز و دەعیە و دەمار بفرۆشێ و پەسنی خۆی بکاو باس لە دۆخ و کەراماتی خۆی بکا. پارێزگار دەڵێ: فلانکەس کێیە و عیبادەتی چییە؟ من هەموو کات بە رۆژووم و هەموو شەوێ بە خەبەرم و هەموو رۆژی قورئان دەخوێنم و کەس بیەوێ بمرەنجێنێ تەفر و توونا دەبێ و فلانکەس ویستی ئازارم بدا، ماڵ و منداڵی فەوتاو ئەوەی پێی کرا، با بە دەواری شرِی ناکا. یاخۆ رەنگە کەسانێ ببینێ کە شەونوێژ دەکەن، ئەم پتر لەوان شەونوێژ کاو هەموویان وەرەزکا، یان تاقمێ ببینێ کە بە رۆژوون، ئەم دەمێ بە برسیەتی دابنیشێ. بەڵام زانا دەڵێ: من چەن جۆر زانستم هەیە، فلانکەس چ دەزانێ و مامۆستای کێ بووە؟ لە شەرەقسەدا هان دەدا تەنگ بە بەرانبەرەکەی هەڵبچنێ، هەرچەند بە شاتوشووتیش بێ. شەوورۆژ لەو بیرەدایە کە قسەیەک، زاراوەیەک یاخۆ شیعری نوێ فێر بێ و لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا خۆی پێ بنوێنێ. هەروەها رەنگە وشەی بیانی و نامۆ فێر بێ تا بەسەر خەڵکیدا زاڵ بێ و کەمایەسی زانایانیتر بنوێنێ. جا ئەوە کام زانا و پارسایە کە کەم تا کورتێ لەم واتایانەی پێنەگەیشتووە کە دیویە و بیستوویە کە پێغەمبەری خودا فەرمووی: «هەرکەس لە دڵدا بە قەدەر کلۆیەک خۆبەزل بزانێ، بەهەشتی لێ حەرامە» و بێجگە ترس و خەم و کەسەر و خوبەکەمگری بە دڵیدا بێ و دەزانێ کە خوداش فەرمووی: «لە لای من هێژای گەر لە لای خۆت بێنرخی، بەڵام کە لە لای خۆت هێژا بووی، لە لای من بێنرخی»؛ جا ئەوەی ئەم راستیەی لێ ئاشکرا نەبووبێ، چاتر وایە پێی بڵێن نەزان، نە زانا.

**هۆی سێهەم**، خۆ بە زلزانی بە هۆی تۆرەمەو رەچەڵەک. هەروەک تاقمێ کە لە بنەماڵەی عەلی بن یاخۆ لە خێزانێکی خانەدان بن، پێیان وایە نووکوبەدی خەڵکوخوا کۆیلە و ئاڵقە لە گوێی ئەمانن، هەرچەند پارسا و ژیر و خاوەن بیر بن. هەروەها رەنگە نەیدرکێنن، ئەم لووتبەرزییەیان لە

---

[1] ـ قورئان، ۱۵۹/۳.

دەروونایە؛ بەڵام کاتێ توورە دەبن خۆیان ئاشکرا دەکەن و دەمودەس خۆ دەردەخەن و دەڵێن: «تۆ چ نرخی ئەوەت هەیە دەگەڵ من ببیتە هاوقسە، مەگین خۆت ناناسی؟» و لەم شات‌وشووتانە.

ئەبووزەر دەڵێ: «جارێک دەگەڵ کەسێک بوو بە قسەم. پێم گوت: "هۆ کوڕی رەش!" پەیغەمبەر فەرمووی: "خەرە مەبە، هیچ سپیەک لە هیچ رەشێک سەرتر نییە، مەگین بە پارێزگاری"». ئەبووزەر دەڵێ: «راکشام و بەو کابرایەم گوت: "پێت بنێ بەسەر سەرمدا"». بڕوانە کە تێگەیشت خۆی بە زلتر زانیوە، چۆن خۆی بە کەم گرت تا ئەو لووتە بە ئاسمان نووساوەی بشکێنێ.

دوو زەلام لە لای پەیغەمبەر شانازییان بە خۆ دەکرد، یەکیان گوتی: «من کوڕی فلان کوڕی فلانم، تۆ کێیت؟» پێغەمبەر فەرمووی: «دوو کەس لە لای مووسا شانازییان بەخۆ دەکرد، یەکیان گوتی من فلانی کوڕی فلانم و تا نۆ پشتی خۆی هەڵدا هەموویان پیاوی گەورە و خانەدان بوون. وەحی هاتە سەر مووسا کە پێی بلێ ئەو نۆ کەسە لە دۆژەهدان و تۆش دەبییە دەیەمینیان». پەیغەمبەر فەرمووی: «واز بێنن لە شانازی بەو کەسانەی بوونەتە پۆلووی دۆژەهـ ئەگینا بێ‌فەڕترن لەو قولانچانەی پیسایی مرۆ بۆن دەکەن و دەیخۆن».

**هۆی چوارم** - خۆبەزلزانیە بە هۆی جوانیوە. ئەمە لە نێوان ژناندا زۆرترە؛ هەر وەک عایشە بە ژنێکی گوت «کورتە بالایە»، پێغەمبەر فەرمووی «خوسپەت کرد و ئەمەش بە بۆنەی بالای بەرزی خۆتە کە لووت‌بەرزی و گەر کورتەبالا بایاتی وات نەدەگوت».

**هۆی پێنجم** - ماڵ‌وسامان دەبێتە هۆی لووت‌بەرزی. وەکوو دەڵێ: «ماڵ‌وسامانی من ئەوەندەیە و تۆ پارسەک و هیچ نەداری و گەر بمەوێ سەد خۆلامی وەک تۆ دەکڕم». چیرۆکی ئەو دوو برا کە لە سوورەی کەهفدا هاتووە و دەڵێ أَنَاْ أَكْثَرُ مِنكَ مَالاً وَأَعَزُّ [1] نَفَرًا، لەم بابەتەیە.

**هۆی شەشم** - هێزی شان و باهۆ دەبێتە هۆی دەمارزلی بەسەر لاواز و بێ‌هێزاندا.

**هۆی حەوتم** - خۆبەزلزانی بە بۆنەی پێرەو و شاگرد و خۆلام و بەندەو بە کورتی ئەوەی بە نیعمەت ناوی دەبرێ، هەرچەند لە راستیدا نیعمەتیش نەبن؛ تەنانەت مێرمەندۆکیش شانازی بە هۆی ژنانیلەیی خۆی دەکا دەگەڵ نێرەمۆکانی‌تر.

ئەمانەی بیژران هۆکانی دەمارزلی و لووت‌بەرزی بوون. بەڵام هۆی ئاشکرابوونیان دوژمنایەتی و رژدی و چنۆکییە؛ چونکە کە کەسێک بە دوژمنی خۆی دەزانێ دەیەوێ شانازی بەسەردا بکا. یاخۆ رەنگە لەبەر مەرایی خۆی لە لای خەڵکی هەڵکێشێ تا زۆرتر رێزی لێ بگرن، تاکوو ئەگەر لەگەڵ کەسێک شەڕەقسەی کرد و ئەو کەسە زاناتر بوو، لە دەروونیدا خۆی بە کەم بگرێ و لە رواڵەتدا خۆی بە زلبگرێ تا خەڵک نەزانن هیچی لێ نازانێ. ئێستا کە هۆکانت ناسی، دەبێ دەرمانیشی بزانی؛

---

١ ـ (قورئان، ٣٤/١٨) ماڵ و دراوم لە تۆ فرەترەو دەست و پێوەندیشم پتر لە تۆیە.

چونکە دەرمانی هەر دەردێ پووچەڵ کردنەوەی هۆکانیە.

**شرۆڤەی دەرمانی لووتبەرزی**

بزانە، دەردێک کە بەقەدەر کلۆیەکی رێگەی بەختەوەری دوارۆژت لێ ببەستێو بەهەشتت لێ بشارێتەوە، دەرمانی فەرز و پێویستە. کەس لەم دەردە خالی نییە و دەرمانی بە دوو جۆرە: یەک بە کورتی و یەک بە وردی.

**دەرمانی بە کورتی بریتیە لە ماجوونی زانست و کردەوە.**

دەرمانی زانستی ئەوەیە کە خودانی خۆی بناسێ و بزانێ تەنیا ئەو شیاوی گەورەیی و مەزنیە و بەس؛ دەبێ خۆیشی بناسێ و بزانێ لە خۆی بچووکتر و بێنەواتر و هەژارتر و لان رەزیلتر، هەر خۆیە و بەس. ئەمە رەوانکەرێکە کە لە بنەوە دەرد دادەماڵی و دایدەشۆرێ و لای دەبا. هەرکەس بیەوێ سەرلەبەری ئەمەی لێ روون بێ یەک ئایەتی قورئان بۆی بەستە کە گوتی: قُتِلَ ٱلۡإِنسَـٰنُ مَآ أَكۡفَرَهُۥ، مِنۡ أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ،ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ، ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقۡبَرَهُۥ، ثُمَّ إِذَا شَآءَ [1]أَنشَرَهُۥ. پەروەردگار بەو جۆرەی کە شیاو بوو ناساندنی و سەرەتا و ئەنجام و ناونجی رێگای پێی نواند.

سەرەتا: گوتی: من ایِّ شیءٍ خلقه، دەبێ بزانێ هیچ شت ناچیزەترو بێ فەرتر لە ئاوی پشت نییە و نەبووە. ئەمە هەر نەبووە و نییە کە ناوی نییە، لە ژێر پەردەی نەبووندا شراوەیە، لە ئەزەلی ئازالدا[2] تا کاتی ئافراندن، هەروەک گوتی: هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَـٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـًٔا [3]مَّذۡكُورًا. پاشان پەروەردگار ئاخی ئافراند کە هیچ لەو خوارتر نییە و تراو و جڵتەی کە دلۆپێ ئاو و خوێنە و لەو کرێتتر هەر هیچ نییە، لە نەبوونەوە ئافراند. بناغەی مرۆڤی لە خاک و ئاوی بۆگەن و خوێنی پیس هێنایەدی. سەرەتا پاروە گۆشتێ بوو، بە بێ گوێ و چاو و زار و هێز و جووڵە، بێگیانێک بوو بێ ئاگا لە خۆی چ بگا بە شتیتر. پاشان چاو و گوێ و دەم و زار و هێز و دەست و پێ و فام و ئاوەزی پێدا. هەروەک دیارە نە لە خاک و نە لە تراو و نە لە جڵتە و نە لە خوێندا هیچ یەک لەم دانستانە نین. لە مرۆدا شتی سەیر و سەمەرەو نوێی زۆری خولقاند، تا گەورەیی و شانوشکۆی پەروەرندەی پێ

1 ـ (قورئان، ٨٠/٢٢-١٧) دەک ئەو مرۆیە بە کوش چێ کە هیچی دەچاودا نییە. لەچی دروستی کردووە؟ لە دلـۆپێک وەدی هێنـاو ئەندازەشی بۆ داناوە. پاشان رێگەشی بۆ خۆش کرد. جامرانی و لە گۆڕی نا. دواجار هەرگا مەیلی لێ بێ دیـسان زینـدووی دەکاتـەوە (هـ).

2 ـ ازل آزال: بریتییە لە ژیانی بوون کە لە نەبوونەوە دەستی پێ نەکردووەو سەرەتای لە نەبوونەوە نەبووە.

3 ـ قورئان ، ٧٦/١. بێ گومانە ماوەیەک لەم رۆژگارە بەسەر مرۆدا تێپەڕی و ئەو شتێ نەبوو باس بکرێ. (هـ)

پیشان بدرێ؛ نەک بۆ ئەوەی پێی لووتبەرز بێ، چونکە بە کۆشەوەی خۆی بە دەستی نەهێناوە تا شانازی پێوە بکا؛ هەروەک گوتی: وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ[1]. جا ئەمە سەرەتای رسکانی مرۆ بوو، خۆت رامێنە و بزانە دەبێ پێی لووتبەرز بێ یان شەرمسار؟

بەلام **ناونجی**: لەم ماوەیەدا هێنراوەتە ئەم جیهانەو ماوەیەک لێرە راگیراوە و ئەم ورەو ئەندامانەی پێ دراوە. جا ئەگەر هاتن و رۆیینی بە دەستی خۆی بایە و لە هەموو شت و هەموو کەس بێنیاز بایە، بووزی دەخوارد بە هەلەدا بچێ و پێی وابێ کەسێکە؛ بەلکوو برسیەتی و تینوێتی و نەخۆشی و گەرما و سەرما و ئێش و ژان و سەد هەزار مێملیتری لەسەر سەری هەلواسی تا چجار لە خۆی ئارخەیان نەبێ و ترسی ئەوەی لە دلدا بێ کە رەنگە بمرێ، کوێر بێ، کەڕ بێ، شێت و پەتیارە بێ، نەخۆش و بریندار بێ یان لە برسان و لە ترسان و لە تینوێتی لەشی بە بێگیان داکەوێ. قازانجی مرۆڤی لە دەرمانی تفتا دانا تا گەر بەهرەی بۆبێ، هەر لەو کاتە بیرەنجنێ و زیانی لە شتمەکی خۆشدا دانا تا دواتر تووشی ئازار بێ. هیچ گرێیەکی بەخۆی نەکردەوە. تا ئەو شتەی کە دەیەوێ بیزانێ، نەیزانێ و ئەوەی بیەوێ لە بیری باتەوە، نەتوانێ و ئەوەی نەیەوی بە بیریدا بێ، دەروستی نەیێ و ئەوەش دەیەوێ بیری لە سەری رامێنێ، لە ژێر دەستی بیری سووڕ بخوا و بخزێ و بۆی رانەگیرێ. بەم هەموو سەیر و سەمەرە کە لە نافراندنی مرۆدا دانیا، وای بێهێز و بێدەسەلات کرد کە داماوتر و بێئەنواتر و هیچ پێنەکراوتر لە خۆی، هەر خۆیە و بەس.

بەلام **ئەنجامی**؛ ئەنجامی ئەوەیە کە دەمرێ و نە هەست و نە گوێ و نە چاو و نە دەم و نە جوانی و نە لەش و نە ئەندامی بۆ دەمێنێ؛ دەبێتە مردارێکی بۆگەنی پیس کە خەلکوخوا لەبەر بۆنی، بینیان دەگرن و لەبەری هەلدێن و دەبێتە پیساییەک لە نێو و لە لای کرم و مار و گیاندارانی ژێر خاک، پاش ئەوەش دەبێتە خاکێکی خوار و بێ فەڕ و بێ هێز. گەر هەرواش بمایا و دەگەل چوارپێیان هاوشان بایە، هەر باش بوو؛ ئەم بەختەشی بەرناکەوێ، بەلکوو لە رۆژی پەسلاندا رادەبێ و لە شوێنی ترس و دلەراوکێی رادەگرن، دەبینێ کە ئاسمانەکان دەقەلشێن، ئەستێرەکان هەلدەورێن، مانگ و خۆر تۆپەل دەکرێن و رەش هەلدەگەڕێن، کەشەکان لە شوێنی خۆیان دەخزێن و وەکی خوری شیوەکراویان لێ دێ؛ زەویش ژێر و روو دەکرێ، فریشتەکانی دۆژەتۆڕ دەهاوێژن و دۆژەهیش دەگرمنێ و فریشتەکان نامیلکەی کردەوەکانی لەسەر دەست دەگرێن، نووکوبەدی کردەکانی بە چاوی خۆی دەبینێ و یەک بە یەکیان دەخوێنێ و ترس و دلەراوکێ دایدەگرێ و ئاوی دەمی بۆ قووت ناچێ، پێی دەلێن: وەرە پێش و پەرسڤدەر بەو بلێ بۆچیت گوت و کرد و خوارد؟ بۆچی رۆنشتی و رابووردی و روانیت و رامای؟ ئەگەر- پەنا بە خوا- دەروستی ئەو پرسانە نەیێ، پێسیری

---

١ـ قورئان (٣٠/٢٠) ئێوەی لە خۆل چێ کرد و ئەوسا ناکاو بوونە مرۆ و لە دنیا بلێو و بوونەوە. (هـ).

دەگرن و لە دۆژەهی دەهاوێژن و خۆیشی دەڵێ:

بریا سەگێ یاخۆ بەرازێ بایدم و لە خاک بەولاوە نەچوایەم و بەم چەشنە تووش نەبوایەم. ئەوەیە بارودۆخی لەو سەگ و بەرازە خوارتر دەبێ، چۆن دەتوانێ لووتبەرز بێ و خۆبەزل بزانێ؛ چونکە گەر هەموو وردیلەکانی زەوین و عاسمان بەڵا و بەختی رەشی بلاوێننەوەو نامەی رسواییەکانی بخوێننەوە، هێشتا پێی ناگەن. قەد دیوتە پادشایەک کابرایەک لە گرتووخانە بهاوێژێ و ترسی لە سێدارەدانی هەبێ و چارەی رەش بووبێ و کەچی لووتبەرزو دەمارزل بێ؟ سەرلەبەری خەڵکی لەم جیهانەدا لە گرتووخانەی خونکاری جیهانن و کەتنی زۆریشیان داوە و ئەنجامی خۆیان نازانن، جا بەم دۆخە کوو دەتوانن خۆ بە زل بزانن؟ ئەوەی بەم جۆرە خۆی ناسی، وەکی رەوانکەرێک مێشکی بە تەکووزی لە هەرچی خۆبەزلزانیە پاکژ دەبێتەوە، بە جۆرێک کە کەس لە خۆی ناکەستر شک نابا. تەنانەت ئاوات دەخوازێ کە بریا خاکێ، مەلێ یان روەکێ بایەو لەم مەترسییە رزگاری بایە.

بەلام دەرمانی **کردەوەیی**، ئەوەیە کە لە هەموو بارودۆخێکدا لە سەر رێچکەی خۆبەکەمگراندا بڕوات؛ هەروەک پێغەمبەر کە لەسەر زەوی نانی دەخوارد و پاڵی نەدەداوەو دەیفەرموو: «من کۆیلەم و وەکی کۆیلە نان دەخۆم».

بە سەلمانیان گوت: «بۆچی جلکی جوان دەبەر ناکەی؟» گوتی: «من کۆیلەم، لە دوارۆژدا گەر رزگار بم، بۆ جلکی بەدەو دانامێنم».

بزانە، یەکێک لە نهێنیەکانی نوێژ خۆبەکەمگرییە کە بە کڕنۆش و سەر نانە سەر خاک دێتە دی؛ چونکە روومەت کە هێژاترین بەشی لەشە دەنرێتە سەر خاک کە خوارترینە؛ عارەب ئەوەندە لووت-بەرز بوون لە هەمبەرکەس پشتییان نەدەچەماندەوە و کڕنۆش بردن، ئازارێکی زۆر گەورە بوو بۆیان. بڕوادار دەبێ هەرچی لووتبەرزی پێی دەڵێ بە ئاوەژووی بجوێتەوەو خۆبەزلزانی -کە بە روومەت و زمان و چاو و دانشتن و بەرگ و جلک و هەموو هەڵس و کەوتەکاندا خۆی دیاری دەدا- بە زۆر هەموویان لە خۆ دوور کاتەوە، تا ببێتە پاژێ لە سروشتی.

### نیشانەواری لووتبەرزی زۆرە:

**یەکەم**، مرۆڤی لووتبەرز دەیەوێ بە تەنیا رێگا نەبڕێ و کەسێکی دەگەڵ بێ. دەبێ خۆی لەمە بپارێزێ. حەسەنی بەسری نەیدەهێشت کەس دەگەڵی بڕوا و دەیگوت: «بەمە دڵم دەگۆڕێ». ئەبوودەردا دەڵێ: «هەرچەند خەڵکی زۆرترت دەگەڵ بێن، پتر لە خودا دوور دەکەویتەوە». پێغەمبەر هەموو جار لە نێوانی خەڵکدا دەڕۆیشت و زۆر جار ئەوانی دەخستە بەر و خۆی لە دواوە دەڕۆیشت.

**یەکێکی‌تر** ئەوەیە کە پێی‌خۆشە خەلک لەبەری رابن و بەرزە پا راوەستن. پێغەمبەر زۆر لە لای کرێت بوو کەسێک لەبەر پای هەستێ. عەلی دەڵێ: «هەرکەس دەیەوێ دۆژەهیەک ببینێ، پێی بلێ سەیری ئەو کەسەی کە دانیشتووەو کەسی‌تر لە بەری راوەستاوە».

**یەکێک‌تر** لە ئاسەوارەکانی لووتبەرزی ئەوەیە کە سەردانی کەس ناکا. سەفیانی سەوری گەیشتە مەکە. ئیبراهیمی ئەدهەم گاسی کرد و گوتی: «وەرە حەدیسمان بۆ بگێڕەوە». سەفیان هات. ئیبراهیم گوتی: «ویستم خۆبەکەمگرییەکەی ئاشکراکەم».

**یەکیکی‌تر** ئەوەیە کە نایەوێ هەژار و پارسەکی لە لا دانیشن. پێغەمبەر دەستی دەدایە هەژار و تا ئەو دەستی ئەمی بەرنەدایە، هەروا دەوەستا. هەروەها هەرکەس نەخۆش و زامار بایە و خەلک ئیتلیسیان[1] لێ بکردایە، دەگەلی نانی دەخوارد.

**یەکێکی‌تر** ئەوەیە کە لە مالی خۆیدا هیچ کار ناکا. پێغەمبەر لە مالی خۆیدا هەموو کارێکی دەکرد. عومەری عەبدولعەزیز میوانی بوو. چراکەیان کوژایەوە. میوان گوتی: «رۆن بێنم؟» گوتی: «نە، کارکردن بە میوان لە مێرخاسی بەدوورە». گوتی: «خولامەکە لە خەو هەستێنم؟» گوتی: «نە تازە خەوی لێ کەوتووە». پاشان خۆی هەستاو دەفری رۆنی هیناو تێی کرد. میوان گوتی: «ئەی ئەمیرەلموئمنین! خۆت هەستایت و تێت‌کرد؟» گوتی: «ئەرێ، کە رۆیشتم عومەر بووم، گەڕامەوە هەر عومەر بووم».

**یەکێکی‌تر** ئەوەیە کە پێداویستیەکانی هەڵناگرێ و نایباتەوە بۆ مال. پێغەمبەر شتێکی هەلگرتبوو و بۆ مالی دەبردەوە، یەکێک ویستی لێی بگرێ تا ئەو نەیبا. نەیهێلاو گوتی خێوی ئەم کالا فەرزترە بۆ هەلگرتنی. ئەبووهورەیرە کۆلێک هێزمی هەلگرتبوو لە بازاڕەوە بەرەو مال دەچوو و دەیگوت: «رێ بدەن با ئەمیر بڕوا»، کاتێ ئەمیر بوو. عومەر لە بازاڕدا دەڕۆیشت، بە دەستی چەپ گۆشتی هەلگرتبوو و بە دەستی راست قەمچی.

**یەکێکی‌تر** ئەوەیە کە تا جل‌وبەرگی لەباری لەبەر نەبێ، ناڕواتە دەرەوە. عومەریان دەدی لە بازاڕدا کە قەمچییەکی بە دەستەوە بوو و جلکەکەی چواردە پینەی پێوە بوو؛ هەندێ لە پینەکان لە چەرمی کۆنە بوون. عەلی تەنیا جلکێکی کۆنەو پەڕپووتی بوو. لۆمەیان دەکرد، دەیگوت: «بەم جلکە دل سەرنەوی دەبێ و خەلکی چاوم لێ دەکەن و هەژاران دلیان خۆش دەبێ». تاووس دەیگوت: «کاتێ جل‌وبەرگم دەشۆم، تا چەن رۆژ لەبەر لووت‌بەرزی و دەمار لییەک کە تووشم دێ، هەدانادەم تا ئەو کاتەی جلکەکەم پیس دەبێتەوە». عومەری عەبدولعەزیز بەر لە دەسەلاتداری کراسی دەکڕی بە هەزار دینار، دەیگوت چاکە بەلام لەمە نەرمترم دەوێ. پاش گەیشتن بە دەسەلات، کراسی دەکڕی

---

١- ئیتلیس: دووری، حەزەر.

بە پێنج درهەم و دەیگوت: «چاکە، بەڵام لەمە زبرتریش هەیە». لێیان پرسی: «مەبەست لەمە چییە؟» گوتی: «پەروەرندەم نەفسێکی گرۆگری پێداوم، زۆری حەز لە شتی باشە؛ هەرچی پێ بدرێ، تامازرۆی چاتر لەوەیە، تا ئێستا کە بۆتە جێگری پێغەمبەری خودا و لەم دونیاش سەرتر لەوەی دەس ناکەوێ؛ بۆیە لە بیری پادشایی هەتاهەتایی دوارۆژایەو گرۆی ئەوەم پی دەگرێ».

پێت وانەبێ کە حەز لە بەرگی جوانکردن، هەمووی بە بۆنەی لووتبەرزی و دەمارزلییە، چونکە کەس هەیە کە هەموو شتێکی بەدەوی خۆش دەوێ، دیاردەشی ئەوەیە لە تەنیاییشدا پێی شاد دەبێ. کەسی واش هەیە بە جلوبەرگی کۆن لووتبەرزی دەکا و خۆ بە پارێزگار دەنوێنێ. عیسا گوتی: «بۆچی بەرگی پارێزگارانتان کردۆتەبەر و دەروونتان وەکوو گورگ لێ کردووە؟ بەرگی پادشایان دەبەر کەن، بەڵام با دڵتان لە ترسی پەروەرێنەرتان نەرم و نیان بێ». کاتێ عومەر سەردانی شامی دەکرد، کراسێکی شڕوشیتاڵی دەبەردا بوو؛ گوتیان: «لێرە دوژمنی زۆرت هەیە، چ زیانێک هەیە بەرگێکی نوێ دەبەرکەی؟» گوتی: «پەروەرندەم، ئێمەی بە هۆی ئیسلامەوە هێژا کردووە، هێژاییم لە هیچ شتێکیتردا ناوێ».

بە کورتی، ئەوەی دەیویست خۆبەکەمگرێ فێر بێ و بیزانێ، دەبێ لە رەوشتی مستەفادا ورد بێتەوەو پێڕەوی لێ کا. بووسەعیدی خودری دەڵێ: «پێغەمبەر، ئالفی مەڕ و مالاتی دەدا، حوشتری دەبەستەوە، خانووی خاوێن دەکردەوە، مەڕی دەدۆشی و پێڵاوەکانی دەدرووەوە و جلکەکانی پینە دەکرد؛ دەگەڵ خزمەتکارەکەی نانی دەخوارد و لە هارەکردندا یاری دەدا و وەکوو ئەو شەکەت دەبوو؛ لە بازاڕدا شتی دەکڕی و دەیپێچایە فۆتەکەیەوە و دەیبردەوە بۆ ماڵ؛ سەرەتا ئەم سڵاوی هەژار و دەوڵەمەند و گەورە و بچووکی دەکرد و دەستی بۆ مەرحەبایی رادەکێشا و لەم کارەدا بەندە و رەش و سپی و پارسەک و دارا جیاوازی نەبوو؛ کراسی شەو و هی رۆژی هەر یەکێ بوو؛ هەر هەژار و تۆزاوی و نەدارێ بانگهێشتنی بکردایە، دەڕۆیشت بە دەنگیەوەو هەرچییان بۆ دانایە، هەرچەند کەمیش بایە، بەڕێزەوە سەیری دەکرد؛ خواردنی شەوی بۆ رۆژ دانەدەنا و خواردنی رۆژی بۆ شەو دانەدەنیا؛ ئاکار بەرز بوو، دلۆڤان و میهرەبان بوو، رووی گەش بوو، بەبێپێکەنین رووی کراوە بوو، بەبێرووگرژی خەمبار دەبوو، بەبێپەستی و زەبوونی خۆی خوار دەگرت، بە بێ تووڕیی بەسام بوو، بەبێدەسبڵاوی، دڵاوابوو، بۆ هەمووان پڕبەزەیی بوو، دڵ ناسک بوو، هەموو دەم سەری داخستبوو، تەمای لە هیچ کەسیش نەبوو». کەواتە، هەرکەس پاپای بەختەوەری دوارۆژی لە دڵایە، چاوی لێ ببڕێ و پێڕەوی لێ کا. لەم سۆنگەوە پەروەردگار پەسنی کرد و گوتی: وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ[1]

١ ـ (قورئان، ٦٨/٤) بەڕاستی کە ئاکاریشت فرە بەرزە. (هـ)

بەڵام **دەرمانی بە وردی** ئەوەیە بزانێ بە چ شتێ لووتبەرز دەبێ:

**یەکەم:** گەر بە بۆنەی تۆرەمەو رەچەڵەکەوە لووتبەرزە، دەبێ سەرەتای خۆی بناسێ، چونکە خوا گوتی: وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ۝ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ[1] واتە: رەچەڵەکت قوڕەو مەودای نێوانتان تراوێکی کەم بایەخ.

کەواتە تراو بابتەو ئاخیش کاڵتە؛ چ شتێ لەم دوانەش خوارترە؟ گەر بڵێی لە بابم بووم، دەبێ بزانی نێوانی تۆ و بابت، تراو و پارووە گۆشت و پز و رسواییترە. بۆچی سەیری ئەوانە ناکەی؟ زۆر سەیرە، گەر بابت خاکی سەرەنگ کردایە، یاخۆ حەجاماتی بکردایە، شەرمت لێی دەکرد، چونکە دەستی لە نێو خاک و خوێندابوو، کەچی تۆ خۆت لە خاک و خوێنی و شانازیش بە خۆت دەکەی! کە ئەمەت زانی، چیرۆکت وەکی ئەو کەسەیە کەپێی وایە لە تۆرەمەی عەلییەو دوو شایەتی دادوەر شایەتی بدەن کە بەندەیە و کوڕی فلان حەجامەتکەرە. کە ئەمەیان لێی ئاشکرا کرد، چجار لووتبەرزی ناکا و شانازی بە خۆی ناکا.

هەروەها ئەوەی شانازی بە تۆرەمەی دەکا، بە هۆی کەسیترەوە خۆی هەڵدەکێشێ. دەبێ خۆت بەڕێز و هێژا بی، نە بە پیاوەتی کەسیترەوە شانازی کەی. کرمێ کە لە پیسایی مرۆوە دەردێ، هیچ هێژاتر لەو کرمەی لە ریخی[2] ئەسپەوە دەردێ نییە.

**دووەم** - خۆبەزلزانی بە هۆی جوانی و خوشیکیەوە. ئەوەی شانازی بە جوانی خۆوە دەکا، با سەیری خۆی کاو لە خۆدا رامێنێ و بزانێ چ کەموکووڕی و شەرموشوورەییەک لە خۆیدا دەبینێ. با رامێنێ و بزانێ چ شەرموشوورەییەک لە نێو گەدەو میزدان و دەمار و کەپۆ و گوێ و ئەندامانی-تریدایە. هەموو رۆژێ چ پیساییەک بە دەستی خۆی لە خۆی دەشواو خۆیشی بێزی نای سەیری کاو بۆنی ببیسێ، کەچی هەردەم لە گەڵیایەو لە راستیدا کۆڵبەری ئەو پیساییەیە. دەبێ بزانێ لە خوێنی مەهک و ئاوی پشت رسکاوەو لەسەر رێ پیسایی تێپەڕاوەو چاوی بەسەر دونیا کردۆتەوە.

تاووس، کابرایەکی بینی بە لەنجەو لار رێگای دەبڕی. گوتی ئەمە هەڵس‌وکەوتی کەسێک نییە کە دەزانێ چی لە ورگیدایە.

مرۆ گەر تەنیا رۆژێ خۆی نەشوا، لە هەموو زبڵدانی پیستر دەبێ، چونکە لە زبڵدانەکاندا هیچ شت پیستر لەوەی نییە لە مرۆڤ دێتە دی. هەروەها جوانی مرۆڤ بەدەستی خۆی نییە تا شانازی پێوە بکاو دزێویش هەر بە دەستی خۆی نییە تا بۆی شوورەیی بێ. جوانیش دڵی پێ نابەسترێ، چونکە بە

---

[1] ـ (قورئان، ٣٢/٧-٨) مرۆی لە ماکی قوڕ وەدیهێنا. لە پاشان نەتەوەی ئەمی لە پالاوتەی چۆڕە ئاوێکی کەم بایەخ وەدی هێنا. (هـ).

[2] ـ ریخ: سەنێر، پەیین.

نەخۆشییەک دەفەوتێ و هاوڵە لە هەموو کەس دزێوتری دەکا. ئەمانە شیاوی لووتبەرزی نین.

بەڵام ئەوەی بە زۆری شان و با هۆی شانازی دەکا، رامێنێ و بزانێ گەر دەمارێکی بە ژان بێ لە هەموو کەس بێهێزتر دەبێ. گەر مێشێک شتێکی لێ بفرێنێ، قەد ناتوانێ لێی بستێنێ. یان ئەگەر تۆفانەیەک بڕواتە نێو کەپۆی یان مێروولەیەک بڕواتە نێو گوێی لە بەرانبەریان خوستی لێ دەبڕێ و تەنانەت رەنگە بیشمرێ. یاخۆ گەر دڕکێک بڕواتە نێو پای لەسەر جێێ خۆی ناتوانێ ببزوێ.

هەروەها ئەگەر پێێ وایە زۆر بەهێزە، گا و کەر و فیل و شێر لەو بەهێزترن. جا چجای خۆبەزلزانی و لووتبەرزییە بە شتێک کە کەر و گا لەوەدا لێی سەرترن.

یان ئەگەر بە شانوشکۆ و دەسەڵات وماڵوسامان و خوڵام و نۆکەرو دەستوپێوەند و حکوومەت و پادشاییەوە شانازی دەکا، ئەمانە هەموویان لە دەرەوەی بوونی ئەون. ئەگەر ماڵەکەی دز ببیا، یان لە دەسەڵات وەلا بخرێ، چی بۆ دەمێنێتەوە؟ هەروەها، جوولەکەو بیانی زۆر هەیە کە ماڵوسامانی لەو پترە. بێ ئاوەز و نەفامی زۆر هەیە دەست و پێوەندی فرەتر لەوە. بە کورتی، هەرچی لە تۆ نەبێ، هی تۆ نییە. ئەمانەش هەموویان قەرزن. لەم هەمووە هیچ شتی هی تۆ نییە.

لە هەموو ئەمانەی بێژران تەنیا زانست و عیبادەت لە رواڵەتدا شیاوی شانازی و لووتبەرزین و دەرمانیشی گەلێک دژوارە، چونکە ئەمە تەواوتر لەوانیترە.. زانست لە لای پەروەردگار هێژا و گەورەیە و لە دانستەکانی پەروەرێنەرە؛ بۆیە زۆر دژوارە بۆ زانا کە ئاوڕ لە خۆی نەداتەوە. ئەمەش بە دوو جۆر ئاسان دەبێتەوە:

**یەکەم،** دەبێ بزانێ ئەرکی زانا فرەترە و خوا زۆرتر چاوەڕوانی لێ دەکاو مەترسی کەوتنە سەر هێڵی لار بۆی زۆرترە، چونکە زۆر هەیە لە نەزان چاوپۆشی دەکرێ، بەڵام لە زانا ناکرێ و هەڵەی زانا گەورەترە. دەبێ لەسەر ئەو خەبەرانەی لەسەر هەڵەی زانا بێژراون، رامێنێ؛ تەنانەت پەروەردگار لە قورئاندا زانای لە راستەڕێ لاداوی بە کەر چواندووە کە بارەکتێوی بە کۆڵەوەیە: كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا[1]، یان بە سەگی چواندووە: كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث[2] واتە بزانێ یا نەزانێ، واز لە سروشتی خۆی ناهێنێ. جا چ شتێ بێ فەڕترە لە سەگ و کەر.

لە راستیدا ئەگەر لە دوارۆژدا رزگاری نەبێ، هەمووەدار و بەردیش لەو سەرتر و هێژاترن، چ بگا بە زیندەوەران. لەم سۆنگەوە بوو یەکێک لە ئەسحاب دەیگوت: «بریا من مەلێ بایام»، یەکێکیتریان دەیگوت: «خوزیا من پووشێ بایام»، ئەویتریان دەیگوت «کاشکی مەڕێ بایام، سەریان دەبڕیم و

---

١ ـ (قورئان، ٦٢/٥) وەکوو نەقلی ئەو کەرەیە کە چەن کتێبی لێ بارە. (هـ).

٢ ـ (قورئان، ١٧٦/٧) نەزیلەی ئەو وەکوو نەزیلەی سەگێکە بۆی بچی زمان دەردێنێ و لێشی گەڕێ زوان دەکێشێ. (هـ)

دەیانخواردم». ئەوەی مەترسی دوارۆژ بزانێ، قەد ناوێرێ لووتبەرزی کا. بۆیە گەر لە خۆی نەزانترێ ببینێ دەڵێ: «ئەو چونکە نەیزانیوە، لە گوناحکردندا لۆمەی ناکرێ و رەنگە خودا لێی ببورێ، کەواتە لە من چاترە؛ گەر کەسێکی بینی لە خۆی زاناتر بوو، دەبێ بڵێ، ئەو لە من زاناترە و شتیوا دەزانێ کە من نایزانم، ئەو لە من چاترە؛ گەر گەنجێ یاخۆ منداڵێکی بینی، دەبێ بڵێ ئەو گوناحی لە من کەمترە، بۆیە لە من هێژاترە؛ تەنانەت گەر کافرێکی بینی، لووتبەرز نەبێ و بڵێ: رەنگە ببێتە موسوڵمان و ئەنجامی باش بێ».

رەنگە زۆر کەس بەر لەوەی عومەر موسوڵمان بێ، خۆیان لەو گەورەتر زانیبێ، کەچی ئەو لووت-بەرزیە لە لای زانستی پەروەردگار هەڵە بوو. کەواتە چونکە گەورەیی مرۆڤ بەستراوە بە رزگاری لە دوارۆژدا و ئەوەش بەرپیوارە، بۆیە دەبی هەرکەس بپەرژێتە سەر ترس لە دوارۆژو خۆ بە گەورە نەزانێ.

**دووەم،** دەبێ بزانێ گەورەیی تەنیا بۆ خوایە و بەس. هەرکەس رکەبەریی دەگەڵ کا، دوژمنایەتی دەگەڵ کردووە. بە هەرکەسی گوتووە، کاتێ لە لای من بە نرخی، کە نرخی خۆت بزانی. کەواتە هەرچەن لە پاشەرۆژی ئارخەیان بێ و بزانێ لە دوارۆژدا بەختەوەرە، نابێ بەم زانینە لووتبەرز بێ؛ چونکە پێغەمبەران خۆیان بە کەم دەگرت و دەیانزانی پەروەردگار گەلێک رقی لە خۆبەزلزانییە. بەلام پارێزکار نابێ خۆی لە زانا -هەرچەند پارێزکاریش نەبێ- بە زلتر بزانێ و دەبێ بڵێ رەنگە زانستەکەی ببێتە تکاکاری لە لای پەروەردگار.

پێغەمبەر فەرمووی: «سەرتری زانا بەسەر پارێزکاردا وەکی هێژایی منە بەسەر یەکێک لە یارانم». گەر نەزانێکی بینی و چەند و چوونی لێ خویان نەبوو، دەبێ بڵێ: ئەمە لە من پارێزگارترە و خۆی نەناساندووە. گەر خراپکار بوو دەبێ بڵێ: گوناحی زۆرم لە دڵدایە و وازوازی و بیری خراپی زۆرم بە مێشکدا تێدەپەڕاوە کە لەو خراپیە ئاشکرایە خراپترە و دەتوانێ هەموو کارە چاکەکانم پووچەڵ کاتەوە، کەچی دەروونی ئەو وەکوو ئاو و ئاوێنە پاکژ و بێخەوشەو گوناحەکانی لەو سۆنگەوە دەسڕێتەوە؛ یاخۆ رەنگە لە گوناحەکانی پاشگەز بێ و ئەنجامی خێر بێ، کەچی من هەڵەیەکم لێ بوەشێتەوەو لە سەرەمەرگدا باوەڕم بکەوێتە مەترسییەوە.

بە گشتی چونکە بووز دەخوا ناوی لە لای پەروەردگار لە ریزی ستەمکاران بێ، لووتبەرزی لە نەزانیە. بۆیە گەورەکان و زانایان و پێشەوایانی ئایین هەموو کات خۆیان بەکەم گرتووە.

## شرۆڤەی لە خۆبایی بوون (عجب) و زیانەکانی

لە خۆبایی بوون لە ریزی ئاکارە دزێوەکانە. پێغەمبەر سێ شتی بە کوشندەدەزانی: رژدی، ئارەزووی نەفس و لەخۆباییبوون. فەرمووی: «گەر گوناح نەکەن، دەترسم تووشیاری شتێکی خراپتر

لە گوناح بن، ئەوەش لە خۆبایی‌بوونە».

لە عایشەیان پرسی: «پیاو کەنگێ ئاکار نزم دەبێ؟» گوتی: «کە پێی وا بوو ئاکار چاکە؛ ئەو بیرەی لەخۆبایی‌بوونە».

ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «فەوتان لە دوو شتایە: لەخۆبایی‌بوون و ناهومێدی». بۆیە گوتوویانە هیوابڕاو بۆ دیتنەوەی ڕێی ڕزگاری بێ وزەیە و لەخۆبایی‌بووش بە هەمان جۆر؛ چونکە پێی وایە بێ-نیازە لە کۆشەوە. «مطرّف» دەڵێ: پێم خۆشە شەوان بنووم و بەیانی دڵشکاو و ترسەنۆک بم لە دواڕۆژم، تا ئەوەی کە هەموو شەوێ نوێژ کەم و بەیانی لە خۆبایی بم.

بێشر کوڕی مەنسوور جارێک نوێژەکەی درێژە پێدا. کابرایەک بەسەر سووڕمانەوە سەیری دەکرد. کە لە نوێژەکەی بووەوە، گوتی: مێرخاس! پێت سەیر نەبێ، چونکە ئیبلیس ساڵەهای ساڵ بەندەگی خودای کرد و ئەنجامی ئەوە بوو کە بوو.

لەخۆبایی‌بوون زیانی زۆری لێ دەبێتەوە: یەکەم خۆبەزلزانیە و خۆی لە خەڵکی سەرتر دەزانێ؛ دووەم، بیر لە گوناحەکانی ناکاتەوەو ئەوەی دێتەوە یادی ناپەرژێتە سەر چارەسەرکردنی و پێی وایە هەموویان دەبەخشرێن؛ هەروەها شوکرانەبژێری عیبادەتی نییە و پیێ وایە لێی بێ‌نیازە؛ لە زیانەکانی پەرستن هیچ نازانێ و وا دەزانێ کە بێ‌زیانە؛ بۆیە ترسی لە دڵ دەڕەوێ و لە فێڵی پەروەردگار ئاگای دەبڕێ. خۆی بە شیاو و لەبار دەزانێ بۆ ئەو عیبادەتەی کە پەروەردگار وەکوو دیاری پێی داوە، کەچی ئەم پەسنی خۆ دەکاو بە خۆیدا هەڵدەڵێ؛ کە بە زانینی خۆی، لە خۆبایی بوو، پرس بە کەس ناکاو گەر بە ئاوەژووی ڕاو بۆچوونی شتێکی پێ بڵێن، گوێی بۆ شل ناکا و بە کوڵەواری دەمێنێتەوە و پەند و مۆچیاری کەس نابیسێ.

## ڕاستەقینەی لە خۆبایی[1] بوون و لووتبەرزی[2]

ئەوەی پەروەرێنەری نیعمەتێکی وەکوو زانست یاخۆ سەرکەوتن لە عیبادەتی پێ بدا و هەردەم بە پەرۆش بێ کە لێی نەستێننەوە یان پووچەڵ نەبێتەوە، ئەوە لووتبەرز و بەفیز نییە؛ هەروەها گەر بە پەرۆش نەبێ و شادبێ بەوەی کە پەروەردگار دیارییەکی ئاوەها هێژای پێداوە، نە بۆ ئەوەی دانستەی خۆیە، بەڵکوو بەو بۆنەوە خوا بەزەیی پێدا هاتۆتەوە، ئەوەش هەر لووتبەرز نییە؛ بەڵام گەر شاد بێ بەوەی کە ئەوە دانستەی ویە و هیچ بۆی بە پەرۆش نەبێ، ئەوە لەخۆی بایی بووە. گەر لەم سۆنگەوە پەروەرندەی بە قەرزداری خۆی بزانێ و عیبادەتی خۆی بە پەرایەکی شیاو بزانێ، ئەوە لە

١ - لەخۆبایی‌بوون: عُجب.

٢ - لووتبەرزی: ادلال.

خۆی‌بایی بووە و خۆی بە هۆی ڕێزگرتن دەزانێ. گەر شتێک بداتە کەسێک و لە دڵدا ئەو کارەی بە نرخدار بزانێ، تووشی لووت‌بەرزی بووەو گەر چاوەڕوانی قەرەوی و پاداش کا، ئەوە لە خۆی بایی بووە.

پێغەمبەر فەرمووی: «نوێژی ئەو کەسەی لە خۆبایی بووە، لە سەری سەرتر ناڕوا». دیسان فەرمووی: «گەر بەردەوام پێ‌بکەنی و دان بە هەڵەی خۆتدا بنی، چاتر لەوەیە بەردەوام ئەسرین بباریێنی و بە کارێکی هێژای بزانی».

## شرۆڤەی دەرمانی لە خۆباییبوون

بزانە، لە خۆبایی‌بوون دەردێکە کە هۆکەی تەنیا نەزانییە و دەرمانەکەشی تەنیا زانینە. ئەوەی شەو و ڕۆژ دەپەرژێتە سەر بەندەگی خودا و بەدەست هێنانی زانست، دەڵێین تۆ لەو شتەی لووت‌بەرزی کە بە سەرتدا دەڕوا و تۆ ڕێگایەکی بۆ تێپەڕبوونە ئەوانە، یا ئەوەی کە لە ناخی خۆتدا هەڵقوڵاوەو بە هێزی خۆت پێکت هێناوە. گەر بە سەرتدا تێدەپەڕێ و تۆ هۆکارێکی بۆ عیبادەت یا زانست، دەسا هۆکار و ڕێگاکەی دەبێ لە خۆبایی بێ، ڕێگا بۆ ڕۆیین تەرخان کراوە و هیچ وزە ودەسەڵاتێکی لەخۆ نییە و دەبێ ڕامێنی و بزانی لەم نێوانەدا چ جێگایەکت هەیە؟ ئەگەر دەڵێی من بەهێز و وزەو خوستی خۆمی دەکەم، باش ڕامێنە و بزانە ئەم هێز و ورەت لە کوێ هێناوە. گەر دەڵێی ئەم کارە بە ویستی خۆم بووە، دەڵێم کێ ئەم ویست و حەز و تامازرۆییەی ئافراند و بە سەرتدا زاڵی کرد و خستتیە بەر کار؟ ئەوەی ئەم خوازەیان لە نێو دڵیدا چاندووە، بریکارێکیان بە سەریدا داناوە کە بە ئاوەژووی ئەوە نەبزوێتەوە، ئەو ویستەش هی تۆ نییەو بە زۆر تۆیان لەسەر ئەو کارە داناوە. کەوابوو، هەمووی ئەمانە نیعمەتی پەروەردگارە و لەخۆبایی بوونت بە بۆنەی نەزانییە و هیچ شت لە دەستی تۆ دانییە[1].

دەبێ سەرت لە بەزەیی پەروەردگار کاس بێ کە ئەو هەموو خەڵکەی لەخۆ بێ‌ئاگا کردووە و ویستیانی لەسەر کاری دزێو و نالەبار تەرخان کردووە و تۆی بە بەزەیی خۆی ڕزگار کردووەو ئەم

---

١ ـ غەزالی لێرەدا ئەوەی دەیڵێ زورتر لە جەبرخوازی نزیکی دەکاتەوە. غەزالی رای وایە هەروەک چەن جار لە بەشە جۆراوجۆرەکانـدا باسی کردووە، مرۆڤ سەرەتا لە سەر غەریزە خولقاوە، بەلام بە پەروەردە و کۆشەوە دەتوانێ بە سەر غەریزەیدا زاڵ بێ و ڕەوتێـک بـەرەو گەشانەوە و گەیشتن بە مرۆڤایەتی بدۆزێتەوە. بەڕای غەزالی کە مرۆڤ بە پەروەردە ڕاهات، لە سەر هەر ڕێچکـە و ڕێبازێـک کـە بـوو، لادان لەو ڕێبازە بۆی دژوارە و دەڕواتە خانەی جەبرەوە؛ بە واتایەکـی ڕوونتـر سـەرەتـا مـرۆڤ بـە ویـست و خواسـتی خـۆی ڕێگـای هەڵدەبژێرێ، کەچی لە ئەنجامدا و بە گوێرەی ڕاهاتن و پەروەردەوە وا لە سەر ڕێبازی خۆی پتەو قایم و سەقامگیر دەبـێ کـە ناتوانـێ خۆی لێ لابدا. بەم بۆنەوە ئەوە خووی بە عیبادەت کردبێ؛ یاخۆ تامەزرۆی زانین بێ، کە لە سەر ئەو ڕێگایـەدا سـەقـامگیر بـوو، هـیچ ویست و ئیرادەیەک لەخۆی نامێنێ و لە ڕاستیدا جەبرە کە بەرەو پێشی دەبا. غەزالی لەمە بەهرە دەگرێ و بۆ نەهێـشتن و بـەرگـری لەخۆبایی بوونی زانا یا عابید، ئەم جەبرەی دەخاتەوە بیر. ئامێدیان.

تامازرۆییەی بەسەر دڵتدا داسەپاندووە و بە زنجیرەی ویستی خۆی پەلکێشت دەکا. گەر خونکارێک بەزەییەکی زۆرتری بە غولامێکدا بێ و خەلاتی بکا، دەبێ هێژایی و دلۆڤانی و بەزەیی خونکاری پێ سەیر بێ کە بەبێ هیچ هۆیەک و بەبێ هیچ چاکەیەک خەلاتی کردووە، نەک سەری لە خۆی کە هیچی نەکردووە سوور بمێنێ. گەر بڵێ: خونکار هۆزانە و تا لە مندا دانستەیەکی نەدیبێ، چاکەم دەگەڵ ناکا؛ پێی دەڵێم: ئەو دانستەیەت لە کوێ هێناوە؟ گەریش خەلاتی خوونکارە چجای لە خۆبایی بوونە. گەر خونکار ئەسپێکت بداتێ و لەخۆت بایی نەبی، پاشان کە خولامێکت پێ دەدا، لە خۆت دەردەچی و دەڵێی، بۆیە پێی داوم چونکە من ئەسپم بوو، ئەوانیتر نەیانبوو. جا کەسی برای کە ئەسپەکەش هەر ئەو پێتی داوە کەی دەبێ لە خۆت بایی بی؟ بەڵکوو وەکوو ئەوەیە کە هەر دوویانی پێکرا پێت دابێ. هەروەها گەر بڵێی بۆیە عیبادەتی بۆ رەخساندووم چونکە پەروەرندەم گەلێک خۆش دەوێ، دەڵێن: کێ ئەم خۆشەویستیەی لە دڵت چاند؟ گەر بڵێی بۆیە خۆشیم دەوێ چونکە ناسیم و جوانیەکەیم دیوەتەوە، دەڵێین: کێ ئەم ناسین و دیتنەی پێت دا؟ کە سەرچاوەی هەمووی ئەمانە خوا بوو، دەبێ گەورەیی و بەزەیی و دلۆڤانی پەروەرندەت پێ سەیر بێ کە ئەم هەموو دانستەی پێ داوی و هێز و حەز و ویستی بۆ ئافراندووی؛ بەلام تۆ لەم ناوەندەدا، هیچ نی و هیچ شتت نییە، بێجگە لەوەی کە کەوتوویتە بەر رێبازی دەسەلاتی پەروەردگار و هیچیدی.

**سەرنج:** پرسیار و وەلام

**پرسیار**- رەنگە کەسێک بڵێ: کە من هیچ نەکەم و هەمووی هی ئەو بێ، چلۆن پاداشم بەردەکەوێ؟ بێگومان پاداشی ئێمە هی ئەو کردانەی ئێمەیە کە بەویستی خۆمانە.

**وەرام** - راستیەکەی ئەوەیە تۆ لەسەر رێگای دەسەلاتی پەروەرندەتی و هیچیتر نی. وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ[1] ئەوەی کردت، تۆ نەتکرد، بەڵکوو خوا کردی؛ بەلام چونکە بزووتنەوەی پاش زانست و وزەو ویست ئافراند، واتزانی تۆ کردووتە. ئەم نهێنیەش ئێجگار وردەو تۆ فامی ناکەی. رەنگە لەم پەرتووکەدا و لە بنەمای یەکەتی و پشتبەستندا هێمای پێ بکرێ. بەلام هەنووکە بە قەدەر فامی خۆت قنیات کەو وا بزانە کە کردەوەت بەبۆنەی هێزی خۆتە. کەچی بزووتنی تۆ بە بێهێز و ویست و زانست بووز ناخوا؛ کەواتە کلیلی کردەکانت لەم سێ شتە دایە.

هەر سێی ئەمانەش دیاری پەروەردگاری تۆن. گەر خەزانەیەک تەژی لە زێڕ و زیو بێ و تۆش

---

١ـ (قورئان، ١٧/٨) کە هاویشتت، هاوێژەرەکە تۆ نەبووی، ئەوە خوا بوو. (هـ).

کلیلی ئەو خەزانەت نەبێ و نەتوانی هیچی لێ هەڵبگری، لەپڕ خودانی ئەو خەزانەیە کلیلی ئەو خەزانەیەت بداتێ و تۆش بیکەیتەوەو دەست راکێشی و زۆرێک زێڕ و زیو هەڵبگری، پێزانینی تۆ دەبێ بۆ خودانی کلیل بێ یا خۆ دەستت؟ خۆت دەزانی کە کلیلت پێ درا، بە دەست وەرگرتنی نرخێکی نییە و دەبێ پێزانینت بۆ ئەو کەسە بێ کە ئەو کلیلەی پێ داوی و ئەو خەڵاتانە بە هی ئەو بزانی. کەوابوو سەرلەبەری هۆکانی دەسەڵاتت کە کلیلی کردەوەکانتن، خەڵاتی پەروەرندەی تۆن.

کەواتە، هێژایی پەروەرندەت پێ سەیر بێ کە کلیلی خەزانەی عیبادەتی پێ داوی و لە خراپکارانی شاردۆتەوەو کلیلی گوناحی پێ داون و دەرکی خەزانەی پەرستنی بە سەردا داخستوون، بەبێ ئەوەی خیانەتێکی لێ دیبن وتەنیا بە پێی دادوەری خۆی و بۆ تۆی ئاوەڵا کردووە، ئەوەش نەک لەبەر خزمەتی تۆ، بەڵکوو لەبەر دڵاوایی خۆی.

کەواتە، ئەوەی لە راستەقینەی تاکپەرستی گەیشت، چجار تووشی لە خۆبایی بوون نابێ. ئەوەش زۆر سەیرە کە زانای هەژار سەری سووڕ دەمێنێ لەوەی کە سامان بە نەزان دراوەو دەڵێ: من ژیرترم، کەچی بێ بەش کراوم.

نازانێ کە ئاوەز چاترینی نیعمەتەکانە و ئەوەش بەو دراوە. گەر هەردووکی ئەمانەی پێ دەداو ئەویتری بێبەش بکردایە زۆر لە دادوەری نزیک نەبوو. رەنگە ئەو نەزانە گلە و گازندەی بکردایە. هەروەها گەر پێی بڵێن فامی خۆت دەگەڵ سامانی وی دەگۆڕیەوە، دەڵێ نە. گەر ژنێکی خوشیک و جوان و بەژن زراف، بەڵام هەژار، ئافرەتێکی دزیو و کرێت بەڵام بەخشڵ و زێڕ و زیو ببینێ، دەڵێ ئەمە چ بەردەبارییەکە[1] کە ئەم هەموو نیعمەتە دەداتە سهێتێ کە هیچ پێی جوان نییە؟

ئەمە فام ناکا کە ئەوەی بە خۆی دراوە هێژاترە. گەر هەردووکی بە خۆی دەدا، لە دادوەری بە دوور بوو. ئەمە وەکی ئەوەیە خونکارێک ئەسپێک بداتە یەکێک و خولامێک بداتە یەکێکیتر. ئەوەی ئەسپی پێ دراوە بڵێ من خێوی ئەسپم، بۆچی خولامی بە کەسێکیتردا؛ ئەمەش لە نەزانیەوەیە.

لەم سۆنگەوە بوو کاتی داوود گوتی: «پەروەرندەم! هیچ شەو نییە کە یەکێک لە بنەماڵەی داوود تا بەیانی نوێژ نەخوێنێ و هیچ رۆژێ نییە کە یەکیان تا ئێوارێ بە رۆژوو نەبێ». وەحی بۆ هات کە: «گەر من ئەم چاکەم دەگەڵ نەکردایەن لە کوێرا دەیانهێنا؟ هەنووکە تاوێک بۆ خۆت بەرهەڵدات دەکەم» کە بەرەڵای کرد تووشی ئەو هەڵەی بوو کە هەموو ژینی هەناسە سارد و لێو بە باری بوو.

ئەیووب گوتی: «پەروەرندەم! ئەم هەموو مێملت بە سەردا باراندم، تۆزکاڵێ ئارەزووی خۆم بەسەر ویستی تۆدا نەدا». لە گز و گوممەت هەورێک هاتە دی و بە هەزار دەنگ گاسی کرد: «ئەم پشوو درێژییەت لە کوێ هێنا؟» ئەیووب تێگەیشت، مشتێک خۆڵەمێشی بەسەر خۆدا کرد و گوتی: «ئەی

---

[1] ـ بەردەباری: حکمت.

پەروەرندەم! لە دلاوایی تۆوە بوو، لە پەیڤی خۆم پاشگەز بوومەوە». پەروەردگار گوتی: وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ[1]، واتە: گەر بەزەیی مە نەبوایە، کەس خۆی بۆ پاکژ نەدەکرایەوە، چ بگا بە کارێکی‌تر، بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «کەس بە بۆنەی کردەی خۆیەوە رزگار نابێ». گوتیان: «تەنانەت تۆش؟» فەرمووی: «تەنانەت منیش، مەگین بەزەیی پەروەردگار رزگارمان کا». لەم سونگەوە بوو کە گەورەکانی سەحابە دەیانگوت بریا ئێمە خاک بوایەتین یاخۆ هەر نەبوایەتین. هەرکەس لەمە گەیشت، قەد لەخۆی‌بایی نابێ.

**سەرنج:** لە خۆبایی‌بوون بە هێز و جوانی و رەچەڵەک، گەوجییەکی تەواوە

بزانە، هەندێ کەس نەزانی و گەوجیان گەیشتۆتە ئاستێ کە بە تشتێک لە خۆبایی دەبن کە هیچ پێوەندی بە دەسەلاتیانەوە نییە، وەکوو هێز و جوانی و تۆرەمە. ئەم نەزانییە، زۆر تۆخترە؛ چونکە ئەگەر زانا و پارێزکار بڵێ: من خۆم زانستم بە دەس هێناوە و خۆم بەندەگیم کردووە، ئەم بۆچوونانەیان هۆیەکی هەیە؛ بەلام ئەمەی‌تر گێلی و گەوجی تەواوە.

کەسی وا هەیە بە تۆرەمەی خونکاران و ستەمکارانەوە لەخۆبایی دەبێ. کەچی ئەگەر دەیانبینێ لە دۆژەهدا چ رۆژێکیان هەیە و لە رۆژی پەسلاندا چۆن دوژمنانیان سووکیان دەکەن، بێزی لێیان دێ. تەنانەت هیچ رەچەڵەکێ هێژاتر لە تۆرەمەی مستەفا نییە و لە خۆبایی‌بوون بەوەش پووچ و بەتاڵە. لە خۆبایی‌بوونی تاقمێ دەگاتە ئاستێ کە پێیان وایە گوناح هیچ زیانیان پێ ناگەینێ و هەرچیان پێخۆش بێ لێی لانادەن. ئەمانە نازانن گەر بە پێچەوانەی باب و کالیان بجووڵنەوە، پێوەندی خۆیان دەگەڵیان پچڕاندووە. ئەمانە هێژایی و شەرەفیان لە خۆ بەکەم‌گری و پارێزکاریدا دەزانی، نەر لە تۆرەمە و رەچەڵەکدا. هەروەها لە تۆرەمەی ئەمانەدا کەسانێک هەبوون کە هەنووکە سەگی دۆژەهن.

پێغەمبەر بەرگری دەکرد لە شانازی‌کردن بە تۆرەمەوە و دەیفەرموو: «هەموو مرۆڤەکان زار و زیچی ئادەمن و ئادەمیش لەخاک رسکاوە». کاتێ بەلال بانگی نوێژی دەگوت، گەورەکانی قورەیش گوتیان: «ئەم خۆلامە رەش‌پێستە کەی بۆی هەیە ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ بنرێ». ئەم ئایەتە هاتەخوارێ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ[2]. کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوار وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ[3]

---

١ ـ قورئان، ٢٤/٢١.

٢ ـ (قورئان، ٤٩/١٣) بەرێزترینتان لە لای خودا، پارێزگارەکانتانن. (هـ).

٣ ـ (قورئان، ٢٦/٢١٤) نزیکترین خزمی خۆشت بترسێنە. (هـ).

گوتی بە فاتمە: «ئەی کچی محەممەدا چاری خۆت کە، چونکە بەیانی کچی من بوون هیچ کەلکێکی بۆت نییە». بە سەفیەی پلکی[1] خۆی گوت: «ئەی پلکی محەممەدا خەریکی کاری خۆت بە، چونکی من دەستت ناگرم». گەر نزیک بوون و خزمایەتی کەلکێکی بۆیان هەبوایە، دەبوا فاتیمەی لە رەنجی پارێزکاری رزگار بکردایە و ژینی بە خۆشی رابواردایە و هەر دوو دونیای بۆ دابین کردایە. بە کورتی، نزیکی لە پێغەمبەر نەختێ هیوا دەخاتە دڵ بۆ تکاکاری، بەڵام رەنگە گوناح ئاوەها بێ کە تکا هیچ کاری بۆ ئەکا. هەروەها هەموو گوناحێ تکا ناپەزێرێ، هەروەک پەروەردگار فەرمووی: وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ[2]. خۆ نەپاراستن لە گوناح بە هیوای تکاکردن، وەکی ئەوەیە نەخۆشێکی گران‌دەرد هیچ پارێز نەکا وهیچ دەرمان نەخوا، بە هومێدی ئەوەی کە بابی پزیشکێکی بەزەبرە؛ دەڵێن رەنگە نەخۆشییەکەت وا زۆر بگرێ و تەشەنە کا کە لێزانی پزیشکیش هیچ قازانجت پێ نەدا. دەبێ مەزاج بە چەشنێ بێ کە پزیشک دەرمانی پێبکرێ. هەروەها وانییەکە هەرکەس لە لای خونکار پلە و پاگەیەک بە دەس بێنێ، بۆ هەموو گوناحێک تکای بۆ بکا، بەڵکوو ئەوەی خونکار بە چاوی نەیار سەیری کا، هیچ تکایەکی بۆ ناکا. هیچ گوناحێ نییە کە نەبێتە هۆی بێزاری؛ چونکە پەروەردگار دزێو بوونی گوناحەکانی شاردۆتەوە، رەنگە ئەوەی بە گوناحێکی بچووکی دەزانی، پتر ببێتە هۆی بێزاری و تووڕەیی خودا، هەروەک خوای مەزن گوتی: وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ[3]؛ واتە:لاتان وایە زۆر ئاسانە و لە لای خودا زۆر گەورەیە. هەموو موسوڵمانێ هیوای بە تکا هەیە؛ بەڵام هیوای تکا ترس لە دوارۆژ لانابا و بە ترس کەس لە خۆی بایی نابێ.

---

١- پلک: پوور، خوشکی باوک.

٢ ـ (قورئان، ٢٨/٢١) هەر کەسێ خۆی رازی نەبێ ناتوانن تکای بۆ بکەن. (هـ).

٣ ـ قورئان، ١٥/٢٤.

## بنەمای دەهەم - باسی بێئاگایی و گومڕایی وخاپێنراوی

بزانە هۆی بێبەشبوونی هەرکەس لە بەختەوەری دوارۆژ ئەوەیە کە ڕێگای نەبڕیوە؛ ئەوەی ڕێی نەبڕیوە یا نەیتوانیوە یان نەیزانیوە؛ ئەوەی نەیتوانیوە، یەخسیری ئارەزووەکانی نەفسی بووەو چاری نەکردووە؛ ئەوەش نەیزانیوە، هۆی بێئاگابوون یا خۆ لاڕێ بوونیە، یا خۆ ئەوەیە کە تووشی جۆرێ بیری هەڵەو لار هاتووە.

ئەو چارەڕەشییەی لە سۆنگەی نەتوانینەوە تووش دێ، ڕاڤەمان کرد. ئەمە وێنەی ئەو کەسەیە کە دەبێ ڕێگایەک ببڕێ و لەسەر ڕێگایدا کۆسپ و ملە و ئاستەنگی زۆر هەیەو ئەمیش بۆ خۆی بێخوست و لاوازە و ئەو ملانەی پێ نابڕێ. ملە و کۆسپەکانی ڕێ، ئارەزووی ماڵ و پلەوپاگە و ورگ و ژێر ورگە. کەس هەیە یەک لەم ملانە دەبڕێ و لە دووەمیاندا دەمێنێتەوە، یا خۆ دووەمیش دەبڕێ و لە سێهەمدا پەکی دەکەوێ، بەڵام ڕێبوار تا سەرلەبەری ئەو کۆسپانە نەبڕێ ناگاتە مەنزڵگای بەختەوەری.

بەڵام ئەوچارەڕەشییەی بە بۆنەی نەزانینەوە تووش دێ،سێ جۆرە:

**یەکیان** بێ ئاگاییە کە پێیدەڵێن نەزانی. ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە لەسەر ڕێگا خەوتبێ و کاروان بە سەریدا تێپەڕێ. گەر کەسێک لە خەو هەڵینەستێنێ، دەمرێ و دەفەوتێ.

**دووەم** جۆری لاڕێبوونە کە پێی دەڵێن گومڕایی. ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە مەنزڵگای لە ڕۆژهەڵاتە، کەچی ڕووی لە ڕۆژاوا ناوەو هەر چەند دەڕوا پتر لە مەنزڵگای دوور دەکەوێ. ئەمە گومڕایی دووری پێ دەڵێن. ئەوەی بەچەپ و ڕاستدا دەڕوا و هەڵوەدایە گومڕایە، بەڵام نەک دوور.

جۆری **سێهەم** خاپێنراوی و هەڵخەڵەتاوی پێدەڵێن. ئەمە چیرۆکی ئەوکەسەیە کە ڕوو لە حەج دەنێ.لە سارادا نیازی بە زێڕی بێخەوش هەیە؛ هەرچی هەیە دەیفرۆشێ و دەیکاتە زێڕ، بەڵام ئەو زێڕە کە پێی دەدەن قەڵبەو زێڕی بێخەوش نییە و خۆشی نازانێ، پێی وایە کە توێشووی ڕێگای دابین کردووە و نیازی خۆی پێک هێناوە. بەڵام کە دەگاتە سارا و زێڕەکانی ڕادەنێ، کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە و بە نسک و ناهەمێ و دەستە ئەژنۆ دەمێنێتەوە. لە مەڕ ئەم تاقمە، پەروەردگار فەرمووی:

قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ۞ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا[1]؛ واتە: زیانکارترینی ئەنگۆ لە ڕۆژی پەسلاندا ئەوانەن کە لە دونیادا خۆ دەرەتێنن و پێیان وایە کە کاری چاکیان کردووەو کەدەڕوانن هەمووی هەڵە بووە. هەڵەی ئەم کەسە ئەوە بووە کە دەبوا سەرەتا زێڕی چاکی بناسیبا و پاشان بیسەندایە، تا دراوی بێخەوشی لە پووڵی قەڵب جیابکردایەتەو. گەر بۆ خۆی زێڕی بێخەوشی نەدەناسی، دەبوا بە بسپۆڕێکی بنواندایە و پاشان بیسەندایە. کەوایشی نەکرد، دەبوایە پێوانەی زێڕی بە دەست بهێنایە. زێڕناس وەکوو پیر و هۆزانە یاخۆ کەسێکە کە گەیشتۆتە ئاستی پیران یا خۆ لە لای پیرێکی هۆزان و شارەزا بێ و کاری خۆی پێ بنوێنێ. کە ئەمانەی پێ نەکرا، دەبێ هانا بەرێتە بەر پێوانەی زێڕ؛ ئەو پێوانەش ئاروزووەکانی نەفسن؛ هەرچی ئەوان حەزیان لێکرد، ئەوە قەڵب و پووچەڵە. لەمەشدا هەڵەی تووش دەبێ، بەڵام زۆربەی لەڕاستی نزیکترە.

کەواتە، نەزانی هۆی سەرەکی چارەڕەشییە و ئەمەش بە وردی سێ جۆرە؛ ناسین و دەرمانی ئەم سێیەش فەرز و پێویستە. چونکە بنەمای یەکەم ناسینی ڕێگایە و پاشان ڕۆیشتن لەم ڕێگایە و کە ئەم دوانەی بۆ پێک هات،هیچ کێشەی‌تر نامێنێتەوە. لەم سۆنگەوە بوو کە ئەبووبەکر لە سکالاکانیدا دەیگوت: «اَرِنَا الحَقَّ حَقّاً وَرْزُقنا اتّباعَهُ وَ اَرِنا الباطل باطلاً وَرزُقنا اجتَنابَهُ»؛ واتە: ڕاستی هەر بەو جۆرەی کە هەیە پێمانی بنوێنە تا بکەوینە دووی، ناڕاستیش هەر بەو جۆرەی کە هەیە پێمانی پیشان دە، تا خۆمانی لێ ببوێرین.

ئەم بەشانەی کە هاتە گوتن و باسیان لێ کرا دەرمانی نەتوانین بوو، ئێستا بڕوێنە سەر دەرمانی نەزانین.

## شرۆڤەی دەرمانی بێ ئاگاری و نەزانی

زۆربەی هەرە زۆری خەڵک‌وخوا بە بۆنەی بێ ئاگاییەوە لە نەزانی دان، تەنانەت نەوەدونۆ لەسەتی خەڵکی ئاوەهان. واتای بێ ئاگایی ئەوەیە کە مەترسی کاری دواڕۆژیان لێ خویان نییە و گەریش ئاگادار بن، خۆیان لەو مەترسییە نابوێرن؛ چونکە مرۆڤ بە چەشنێ ڕسکاوە کاتێ هەستی بە مەترسییەک کرد، خۆی لێ دەبوێرێ، هەرچەن ڕەنجی زۆریش ببات؛ ئەم مەترسییە یان بە تیشکی ڕۆناهی پێغەمبەرایەتی ئاشکرا دەبێ، یا خۆ بە گاس‌کردنی پێغەمبەران، یان بە هاواری زانایان کە میراتبەری پێغەمبەرانن؛ بە ڕاستی کە هەر کی لەسەر ڕێگا شەکەت بوو و خەوی لێ کەوت، هیچ دەرمانی نییە بێجگە لەوەی کە بەخەبەرێکی دلۆڤان پێی بگات و لە خەوی هەستێنێ؛ ئەم بەخەبەرە

---

١ ـ قورئان (١٨/١٠٤،١٠٣).

دلۆڤانە پێغەمبەر و جێگرانی پێغەمبەر و زانایانن.

سەرلەبەری پێغەمبەران بۆ ئەم مەبەستە ناردراون. هەر وەک خوای مەزن فەرمووی: لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ [1]غَـٰفِلُونَ؛ هەروەها گوتی: لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ [2]يَهْتَدُونَ؛ دەڵێ ئەی محەممەد! بزانە تۆمان نارد تا خەڵک لەخەوی بێخەبەری هەستێنی و پێیان بڵێی إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَفِى [3]خُسْرٍ؛ هەموو خەڵکی لەسەر رۆخی دۆزەخ ئافرێندراون. فَأَمَّا مَن طَغَىٰ • وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا • فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ • وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ؛ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ [4]ٱلْمَأْوَىٰ؛ هەرکی هێنرایە دونیا و کەوتە شۆپی ئارەزووەکانی نەفسی و رووی لە دونیانا، کەوتە نێو دۆزەە. هەوای نەفس وەکوو بووریایەکە[5] کە بەسەر چاڵی دۆزەهدا خرابێ، هەرکەس بە سەریدا بڕوا بێگومان دەکەوێتە بنی چاڵ و هەرکەس ئاوڕی لێ نەدایەوە، خۆی رزگار کرد. شاوەت وەکوو ملەیە بەسەر رێی بەهەشتدا، هەرکەس بڕی و لێی تێپەڕی بێ‌گومان دەگاتە بەهەشت، بۆیە پێغەمبەر فەرمووی:

«حُفَّتِ الجَنَّةُ بِالمَكارِهِ وَ حُفَّتِ النّارُ بِالشَّهَواتِ[6]». کەواتە ئەو خەڵکەی لە دەشتدا دەژین، وەکوو ترک و عارەب، کە زانایان لە نێودا نییە و کەس نییە بە خەبەریان کاتەوەو لە مەترسی دواڕۆژ بێ ئاگان، چچار رێ نابڕن؛ خەڵکی گوندیش هەروان؛ چونکوو زانا لە گوندا کەمترە و گوند وەکی گۆڕستان دەمێنێ، هەروەک لە خەبەردا هاتووە کە «اَهلُ الکُفرِهُم اَهلُ القُبُور[7]». ئەوەش کە لە شاردا دەژی، بەلام لەو شارەدا زانایەکی هۆزان کە لەسەر منبەر مۆچیاری خەڵک کا نییە، یا خۆ هەیە و پەرژاوەتە سەر کاری دونیا، لە خەوی نەزانیدا دەمێنێتەوە؛ چونکە کە ئەم زانایە خۆی کاس و وڕ و بێ‌ئاگایە، چۆن کەسی‌تری پێ خەبەردار دەکرێ؟ بەلام ئەگەر لەو شارەدا زانایەک بێ کە بڕواتە سەر مینبەر و وەکوو پەندبێژانی بێ‌ئاکار بە چەن قسەی جوان و بێ‌کاکڵ و بەڵێنی بەزەیی پەروەردگار، خەڵک بخاپێنێ کە لەسەر هەر بیر و بۆچوونێک بن، بەزەیی خودایان بەردەکەوێ، حاڵی ئەم هۆزە لە هی بێ ئاگاکان خراپترە؛ ئەمانە وەکی ئەو کەسەن کە خەویان لێ کەوتبێ و یەکێک بە خەبەریان کاتەوە و بە مەی و

---

١ ـ (قورئان، ٦/٣٦) تا ئاگادار بکەیتەوە ئەوانەی کە باب و کالی پێشوویان لە خوای نەترساندوون و بێ ئاگان. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ٣/٣٢) تا ئاگادار بکەیتەوە ئەو هۆزەی کە بەرلە تۆ کەس ترسی وەبەرنەناون، بەشکوو بەرێی‌ڕاست بزانن. (هـ)

٣ ـ (قورئان، ٢/١٠٣) مرۆ گشتی زیانبارە. (هـ)

٤ ـ (قورئان، ٣٧/٧٩-٤١) جا هەر کەسێ کە سەربزێوی کردووەو ژینی دونیای بژاردووە، دیارە جەهەندەم جێیەتی. بەلام کەسێ لە گەورەیی پەروەرندەی خۆی ترساوە و لەئارەزووی نەفسی وازی هێناوە، دیارە بەهەشت ئەنوای ئەوە. (هـ)

٥ - بووریا: حەسیر.

٦ ـ سەختیەکان لێواری بەهەشتیان داگرتووەو شاوەت و خۆشییەکانیش دەوری دۆزەهیان داوە.

٧ ـ گوندنشینان وەکی خەڵکی گۆڕستانن.

شەراب مەست و سەرخۆشیان کا. ئەم کەسانە پێشتر بە ئاسانی لەخەو ڕادەبوون، کەچی ئێستا گەر پەنجا تووکە شەقیان لێ بدرێ بە خۆ نازانن و سەر هەڵنابڕن و دەڵێن: خوای مەزن دلۆڤان و دەهندەیە و گوناحی من چ زیانێ بەو دەگەیێنێ، بەهەشتی خودا بەرفراوانتر لەوەیە کە جێگای یەکێکی وەک من تێیدا نەبێ و بەم شات و شووتانە خۆ دەخاپێنن. هەر پەندبێژێک کە وابێ، دەستی لە خوێنی خەڵکدایە. ئەمە وەکوو ئەو پزیشکەیە کە بە نەخۆشێک کە لە ئاوری یاو و تادا خەریکە دەمرێ، هەنگوین دەداو دەڵێ، هەنگوین شەفای تێدایە. هەنگوین دەرمانی دەردێکە کە هۆکەی ساردی بێ نەک گەرمی. ئایەت و ئەخبارێ کە لەمەڕ هێڤی و ئومێدن بە بەزەیی خودای مەزن، دەرمانن، بەڵام تەنیا بۆ دوو نەخۆش:

**یەکەم** - بۆ کەسێ کە ژینی تەژی لە گوناح بێ و هیوابڕاو بێ و بڵێ خودا قەد لە من نابوورێ و لەسەر هیوابڕاوی لە کردەی خۆی پاشگەز نەبێ و بڵێ چجار تۆبەی من وەرناگیرێ. ئەم ئایەتە دەرمانی وییە قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ[1] بەو مەرجەی کە ئەم ئایەتەی کە دوابەدوای دێ بخوێنییەوە کە دەڵێ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ[2] پێی بڵێ کە ناهومێد مەبە، پەروەردگار سەرلەبەری گوناحانی لە گوناح پاشگەز بوو دەبوورێ.

**نەخۆشیتر** ئەو کەسەیە کە بە جۆرێ ترسی بە سەردا زاڵ بووبێ کە لە عیبادەت هەدانەدا و بۆی هەبێ کە لە ترسان و تێکۆشانا خۆی بکوژێ و هیچ شەو نەخەوێ و خواردنی کەم بخوا؛ ئەم ئایەتانە کە هێڤی دەرن، مەرهەمێکن بەسەر ئەم دەردەدا. بەڵام کە ئەم پەیڤانە بە بێئاگا و ترس بڵێی، وەکوو خوێیە بەسەر برینداو دەردکەی تەشەنە دەکا. هەر وەکوو چۆن پزیشکێک دەرمانی یاو و تا بە هەنگوین بکا، خوێنی نەخۆشی لەئەستۆیە، ئەم زانایانەش خوێنی دینی خەڵکیان لە ئەستۆیە و هەڤالی دەجاڵ و چاوساغی شەیتانن و لە هەر شارێک کە ئاوەها زانایەک بێ، شەیتان سەربەوشارەدا ناکا، چونکە بریکارێک نووکوبەدی کارەکانی بۆ جێبەجێ دەکا.

بەڵام گەر پەیڤی زانا بە گوێرەی شەرع و ترسانی خەڵک بێ و نێوان ڕابگرێ، کەچی کار و بار و هەڵسوکەوتی بە ئاوەژووی پەیڤی بێ، بێخەبەری بە قسەی وی لاتابرێ. ئەمە چیرۆکی ئەو

---

1ـ (قورئان، ٣٩/٥٣) بێژە: ئەی عەبدەکانی من! ئەی ئەوانەی کە بە لادان لە ئەندازە ناهەقیوو لە خۆ کردووە! نابێ ئێوە لەبەزەیی خوا ناهومێد بن، چونکە لە هەموو گوناهێک چاودەپۆشێ؛ ئەولێبووردە و دلۆڤانە. (هـ)

2ـ (قورئان، ٣٩/٥٤) وەگەڕێنە لای پەروەرندەی خۆتان و خۆتان هەر بەوی بسپێرن، بەرلەوە ئازارتان بۆ بێ و کەسیش دەهاناتان نەیە. (هـ)

کەسەیە تەبەقێ هەڵوای لە کۆش ناوەو بە هەڵپە هەڵپ لێی‌دەخوا و هاوار دەکا: خەڵکی! ئاگادار بن کەس توخنی ئەم هەڵوا نەکەوێ، تژی لە ژاری کوشندەیە. خەڵکی بەم ژارە پتر تامازرۆ دەبن و دەڵێن بۆیە وا دەڵێ کەس توخنی نەکەوێ و بە تاقی تەنێ هەمووی بخوا و کەس نەبێتە هاوبەشی.

بەڵام گەر پەیڤ و هەڵس‌وکەوتی وەکی یەک بن و وەکوو پێشوونان هەڵس‌وکەوت کا، خەڵکی خەواڵۆی بێ حاڵ رادەچڵەکێنێ، گەر خەڵک دان بە پەیڤیدا بنێن؛ بەڵام گەر دانی پێدا نەنێن، یاخۆ گوێ بۆ قسەی رانەگرن، هەروا خەواڵۆ دەمێننەوە و دەبێ تا دەتوانێ لە خەڵکی نزیک کەوێ و بڕواتە مالیان و بانگهێشتنیان کاتە لای خۆی.

بەم وتانە ئاشکرا بوو کە نەوەدونۆ لە سەتی خەڵکی لە نێو پەردەی بێ‌خەبەریدان و مەترسی دوارۆژیان لێ بەرپیوارە.

بێ‌ئاگایی دەردێکە کە دەرمانی لە دەستی دەردەداردا نییە، چونکە نەزان، ئاگای لە بێ‌ئاگایی خۆی نییە، چۆن دەرمانی پێ دەکرێ؟ دەرمانی ئەم دەردە بە دەستی زانایانە. رابوونی منداڵان لە خەونی نەزانی، لە سۆنگەی دایک‌وباب و مامۆستایە، خەڵکیش بە بۆنەی قسە و گفتی بێژەر و زانایانە کە رادەبن؛ بەڵام چونکە لەم رۆژگارەدا زانا و بێژەری راستەقینە بە دەگمەن دەست دەکەون، دەردی بێ‌ئاگایی درێژخایەن بووە و خەڵکی زۆری تووش بووەو کە باسی دوارۆژ دەکەن، تەنیا بەسەر زاریاندا تێدەپەڕێ و لە کاکڵە و ناوەرۆک بۆش و بەتاڵن و دەروونیان لە دەردی ئەم مێملە و ترسی ئەم مەترسییە بێ‌ئاگایە. ئەمە بە قازانجی کەس نییە.

## شرۆڤەی گومڕایی و دەرمانەکانی

تاقمێ‌تر هەن کە لە دوارۆژ بێ‌خەبەرن، بەڵام بڕوایەکیان هەڵبژاردووە کە بە ئاوەژووی راستەقینەیە و لە راستەڕێ کلابوون و ئەو گومڕاییە بۆتە پەردە لەبەر چاویان؛ بۆ روون‌کردنی ئەم بابەتە پێنج وێنا دێنیینەوە تا لێت ئاشکرا بێ:

**وێنەی یەکەم**- بڕێ کەس دوارۆژیان بە درۆ زانیوە و دەڵێن مرۆڤ کە مرد ئیدی نامێنێ، وەکی روەک کە وشک دەبێ یاخۆ چرا کە دەکوژێتەوە. لەم سۆنگەوە هەوساری شەرمیان داناوە و بە ئارەزووی نەفسیان دەژین و پێیان وایە ئەوەی کە پێغەمبەران گوتوویانە بۆ راهێنانی خەڵک‌وخوا بووە لەم جیهانەدا یان بە دەست هێنانی پلەوپاگە و شان‌وشکۆی دونیاییان مەبەست بووە؛ تەنانەت رەنگە بە راشکاوی بڵێن کە ئەم باسی دۆژەەو بەهەشتە وەکوو ئەوەیە بە منداڵێ بڵێن گەر نەڕۆیتە قوتابخانە، دەتنێرینە ماڵی مشکان. جاخۆ ئەگەر لەم باسەشدا رامێنێ و تێبگا، دەزانێ کە ئەو چارەڕەشییە کە منداڵ لە سۆنگەی نەزانییەوە تووشیاری دێ، لە ماڵی مشکان خراپترە. هەروەک

ڕووناکدڵان تێگەیشتوون کە چارەڕەشی نەدیتنی پەروەردگار خراپترە لە ئاوری دۆژەە، هۆی ئەوەش دانەپەی ئارەزووی نەفسە، بەڵام نەسەلماندنی ئەمە بە دڵی تەبعی مرۆڤە و لە ڕۆژگاری ئاخرەزەماندا بەسەر دڵی زۆربەی خەڵکدا داسەپاوە، هەرچەند بەزار نەیڵێنەوە. تەنانەت ڕەنگە لە خۆیشیان بیشارنەوە، کەچی لە هەڵس‌وکەوتیاندا ئاوەزیان وا دەنوێنێ کە لە ترسی ڕەنجی داهاتووی دونیا، ڕەنجیکی زۆر دەدەنە بەر خۆ؛ گەر ترسیان لە دواڕۆژ هەبوایە، وا بە سووک و ئاسان سەیریان نەدەکرد. دەرمانی ئەمەش بەو جۆرەیە کە ڕاستەقینەی دواڕۆژیان لێ خویان بێ؛ ئەوەش بە سێ جۆر دەکرێ:

**یەکەم** - ئەوەیە کە بە دیتن، بەهەشت و جەهەندەم و بارودۆخی بەندە و سەربزیو کە مردوون، ببینن؛ ئەمەش تایبەت بە پێغەمبەران و ئەولیایە، چونکە ئەم کەسانە هەر چەن لەم دونیا بن، بەڵام لەو حاڵەی کە بۆیان دیتە گۆڕێ و پێی دەڵێن توانەوەو دابڕان لە دونیا، بارودۆخی ئەو جیهانی‌تر بە چاو دەبینن. هەستەکان و ئارەزووەکانی نەفس، کۆسپ و لەمپەرێکن لە بەرانبەر ئەم دیتنەدا. لەسەر دێری ئەم پەرتووکەدا هێمایەک بەم واتایە کرا. ئەمەش گەلێک بە دەگمەنەو ئەوەی بڕوای بە دواڕۆژ نەبێ، چۆن بەمە باوەڕی هەیە و لە کوێ دەکەوێتە دووی و کە کەوتە دووی کەی پێی دەگا؟

**جۆری دووەم** - ئەوەیە کە بە بیر و بەڵگە بزانێ ڕاستەقینەی مرۆڤ چییە و گیان کامەیە، تا لێی خویان بێ کە گیان گەوهەرێکی قایم بەخۆیە و لەم جەندەکە بێ نیازەو بەبێ ئەم جەستەش ژینی هەر هەیە. ئەم لەشە وڵاخ و کەرەستەی دەستی وییە، نەک هۆی بوونی، تا بە نەبوونی ئەم خۆیشی نەبێ. ئەمەش بۆ خۆی چەشنێک لە ڕێگای تێگەیشتنە، بەڵام ڕێگایەکی ئێجگار هێژا و دژوار، ڕێگایەک کە تایبەت بە زانایانی کوڵنەدەرە لە زانستدا. ئەمەش لە سەردێری ئەم پەرتووکەدا ئاماژەی پێ کرا.

**ڕێگای سێهەم** - ئەم ڕێگەیان هی هەموو خەڵکە. ئەوەیە کە ڕووناهی ئەم تێگەیشتنە لە پێغەمبەران و ئەولیاو زانایانەوە بگاتە ئەو کەسانەی کە دەیانبینن و دەگەڵیان ئاخافتنیان هەیە؛ ئەمە پێی دەڵێن باوەڕ. ئەوەی پەیڤی پیرێکی زانا و زانایەکی پارێزکار یاریدەی نەدا، لە گوناحدا دەمێنێتەوە. هەرچەن پیر و زانا گەورەتر بێ، بڕوایەک کە لە گەیشتنی ڕۆناهی ئەوەوە بە خەڵک دەگا، مەزنترە. بۆیە بەختەبەرزترینی خەڵک، یارانی پێغەمبەر بوون کە لە نزیکەوە چەندوچوونی حاڵی مستەفایان دەدی. پاش ئەوان تابعین بوون کە بەختی دیتنی یارانی پێغەمبەریان هەبوو. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی:

«خَيرُ الناسِ قَرنِی ثمَّ الَّذینَ یَلونَهُم[1]». چیرۆکی ئەم تاقمە وەکی ئەو منداڵەیە کە دەبینێ هەرگا بابی مارێک دەبینێ لە بەری هەڵدێ و خانووی بۆ بە جێ دێڵێ، بۆیە دڵنیا دەبێ کە مار خراپەو دەبێ لە بەری هەڵبێ. وای لێ دێ بە بێ ئەوەی راستەقینەی زیانی مار بزانێ، لە هەر کوێ مار ببینێ لە بەری هەڵدێ. یاخۆ رەنگە ژنەفتبێتی مار ژاری هەیە و ژاریش خراپە و راستەقینەی ژار نەزانێ، بەڵام بە تەواوی لێی بترسێ.

وێنەی دیتنی پێغەمبەران وەکوو ئەوەیە کە دیبێتی مار کەسێکی گەستووە و مردووە، کەسی‌تریشی گەستووە و کوشتووە، زیانی ماری بە چاوی خۆی دیوە و ئەمەش ئەو پەڕی بڕوایە . وێنەی بەڵگەهێنانەوەی زانای پایەدار ئەوەیە کە ئەوەی نەیدیوە بەڵام بە جۆرێک هەڵسەنگاندن مەزاجی مرۆڤی زانیوە و مەزاجی ماری ناسیوە و لە دژایەتی نێوانی ئەم دوانە گەیشتووە.

ئەمەش دڵ دادەمرکێ و دڕدۆنگی دەسڕێتەوە، بەڵام نە وەک دیتن. بڕوای سەرلەبەری خەڵکی -بێجگە زانایانی مەزن- لە سۆنگەی پێوەندی دەگەڵ زانایان و گەورەکانەوە دێتە دی. ئەمە نزیکترین دەرمانە.

**وێنەی دووەم** - گومڕایی ئەوەیە کە تاقمێ دوارۆژ بە درۆ نەزانن و بە نەمانی مرۆڤ پاش مردن بڕوایان نەبێ، کەچی سەریان لەم کارە کاسە و دەڵێن بە راستی کە کەس تێی ناگا. بۆیە شەیتان دەبێتە رێبەریان و پێیان دەڵێ دونیا ئارخەیانییە و دوارۆژ گومان، دڵنیایی بە گومان ناگۆڕدرێتەوە. ئەمەش بەتاڵە، چونکە بڕواداران لە دوارۆژ دڵنیان.

دەرمانی ئەم کەسانە ئەوەیە کە پێیان بڵێی: هیچ گومانێک لە تاڵی دەرماندا نییە و کەچی دەرمان بۆ خۆی گوماناویە. مەترسی رۆنیشتن لە نێو گەمیە ئاشکرایە، کەچی گەیشتن بە قازانجی بازرگانی هاتونەهاتە. گەر کەسێک لە کاتی تینوێتیدا پێت بڵێ لەم ئاوە مەخۆرەوە مار دەمی پێدا ژەندووە — هەرچەند چێژی خواردنەوەی ئاو ئاشکرایە و ژار نادیار- بۆ نایخۆیتەوە؟ کەچی تۆ دەڵێی پشوودرێژبوون لەسەر تینوێتی چاترە لە مردن. هەروەها چێژ و خۆشی دونیا پتر لە سەدساڵ نییە و پاش ئەوە وەکوو خەونێکە، کەچی دوارۆژ هەتاهەتایە و ناتوانی تەمەنی بەو درێژییە وا بە سووک و ئاسان بگری. ئەگەر درۆ بێ، وا بیر کەوە کە هەر ئەم چەن رۆژە نەژیاوی، وەکوو چۆن هەر لە رۆژی ئەزەڵەوە نەبووی و لەمەبەدواش نیت؛ بەڵام گەر راست بێ لە ئازارێکی هەتاهەتایی رەستووی. بەم بۆنەوە عەلی بەبێ دینێکی گوت: «گەر وابێ کە تۆ دەڵێی، هەمووومان دەرباز بووین، ئەگینا ئێمە دەخەلسین و تۆش تووش دەبی».

---

[1] ـ بەختەوەرترینی خەڵکی ئەو کەسانەن کە لە رۆژگاری مندا دەژین و پاش ئەوان کەسانێکن کە دوای ئەوان دێن.

**وێنەی سێهەم-** ئەوەیە کە تاقمێ بڕوایان بە دوارۆژ هەیە، کەچی دەڵێن دوارۆژ قەرزە و دونیا نەختە، نەخت لە قەرز چاترە. کەچی ئەمە نازانن نەخت لە قەرز کاتێ چاترە کە وەکوو یەک بن، بەڵام گەر قەرز هەزار بێ و نەخت یەک، هەزاری قەرز چاترە؛ هەر بەو چەشنەی نووک و بەدی پێوەندییەکانی خەڵک وایە. ئەمەش لە ریزی گومڕاییەکانە کە کەس ئەم رادە نازانێ.

**وێنەی چوارەم –** ئەوەیە کە بە دوارۆژ باوەڕی بێ، بەڵام چونکە ئەم دونیایەی بۆ تەیار بووە و بە گوێرەی ویستی خۆی ژیاوە، دەڵێت: هەروەک چۆن ئێرەم بۆ تەیارە، ئەو دونیاش هەر بە کەیفی خۆمە، چونکە پەروەرندەم لەبەر خۆشەویستی ئەم سامانەی کردۆتە بەشم، سبەینێش هەروا دەبێ؛ ئەمە وەکوو سەربهوردی ئەو دوو برایەیە کە لە سوورەی کەهفدا گێڕاویەتەوە کاتێ یەکیان گوتی: وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا[1]؛ ئەویتر گوتی: إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ[2].

دەرمانی ئەمە ئەوەیە کە بزانێ، گەر پیاوێ منداڵێکی هێژا و خولامێکی بندەستی بێ و منداڵەکەی بنێتە بەرخوێندن و هەموو رۆژێ منداڵەکەی بکەوێتە رێ بۆ قوتابخانە و دەرس و وانە و لێدانی مامۆستا، کەچی چونکە خەمی بەختڕەشی خولام ناخوا بەحاڵی خۆی بێڵێتەوە تا بە کەیفی خۆی بژی. گەر ئەم خولامە پێی وابێ کە خودانی لەبەر خۆشەویستی بەرەڵڵای کردووە تا بە کەیفی خۆی بژی و ئاوڕی لێ ناداتەوە و ئەمی لە منداڵی خۆی پتر خۆش دەوێ، ئەوە لە نەزانیوە بە بیریدا تێپەڕیوە.

نەریتی پەروەردگار وایە کە دونیا لە خۆشەویستانی درێغ دەکاو بەسەر نەیارانیدا دایدەبارێنێ؛ ئاسوودەگی ئەم کەسانە وەکی ئاسوودەیی ئەو کەسەیە کە کار ناکا، هیچ ناچێنێ و لە ئەنجامیشدا هیچ نادروێ و هیچ هەڵناگرێ.

**وێنەی پێنجەم-** ئەوەیە کە دەڵێن پەروەردگار دەهندە و دلۆڤانە و بەهەشت لە کەس درێغ ناکا. ئەم نەزانە نازانێ کە چ بەزەیی و دلۆڤانیەک پتر لەوە نییە کە ئەو هۆکارەی پێ داوە کە توویەک بچێنێ و حەوتسەد توو هەڵگرێ و لەو سۆنگەوە بگاتە پادشایی هەتاهەتایی. ئەگەر واتای بەزەیی و دلۆڤانی ئەوەیە کە بەبێ رەنج کێشان بەرت بەرکەوێ و خەرمان هەڵگری، دەی‌سا بۆچی خۆ بە

---

١ ـ قورئان (١٨/٣٦) گەر هەر براشمەوە بۆ لای پەروەرندەم، دەزانم لەمەش چاترم دەس دەکەوێ. (هـ)

٢ ـ قورئان (٤١/٥٠) خۆم دەزانم پتر چاکەم دەگەڵ دەکا. (هـ)

کشتوکاڵ و مامەڵە و کار و دابین‌کردنی بژیووە ماندوو دەکەی؟ بۆ خۆت بە بێ‌کار و هەوڵ و تەقالا دانیشەو خوای دلۆڤان بژیوی ژینت دابین دەکا. هەرچەند خودا خۆی فەرموویە: وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا[1]، بڕوات بەو بەزەیی و دەهندەییە نییە، کەچی باوەڕت بەو بۆچوونەی خۆتە هەیە، بە بوونی ئەوەش کە دەڵێ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ[2]؛ ئەمە ئەوپەڕی گومڕاییە. هەروەک پیغەمبەر فەرمووی: «اَلاَحمَقُ مَنِ اتَّبَعَ نَفسَهُ هَوِيها وَ تَمَنَّى عَلَى الله[3]».

هەروەک ئەوەی کە زۆر گەوجییە کەسێک بەبێ ئەوەی ژنی هێنابێ، بە هیوای منداڵ بێ، یاخۆ ژنی هێنابێ و توخنی نەکەوتبێ، یان توخنی کەوتبێ و خۆی کێشابێتەوە و هیوادار بێ کە ببێتە خاوەن منداڵ. هەرچەن پەروەردگار بەبێ گەراش منداڵ دێنێتە دی، بەڵام ئەوەی توخنی ژنی کەوێ و تووی بچێنێ و پاش ئەوە هیوای بە پەروەردگار بێ کە تووشی زیان نەیێ و منداڵێکی بۆ بێتە دی، ژیر و زانایە. هەروەها ئەوەی بڕوای نەبێ، یان بڕوای هەبێ و کاری چاک نەکا و هیوادار بێ لە سزا و ئازار دەرباز بێ، گێل و نەزانە؛ بەڵام ئەوەی باوەڕی هێنابێ و لە چاکەش هیچ خۆی لانەدا و هیوادار بێ کە بەزەیی خودای بەرکەوێ و لە گیانەڵادا هانای دەکەوێ و دەستی دەگرێ، ژیر و زانایە و ئەویتریان ڕێی لێ تێکچووە. ئەوانەی دەڵێن خودای مەزن ژینی ئەم دونیای بۆ پێک هێناوین، ژینی ئەولاشمان بە چاکە بۆ دابین دەکا، چونکە دلاواو دلۆڤانە، ئەمانە خاپێنراون، ڕاستەڕێیان لێ تێکچووە. پەروەردگار لۆمەی هەر دوویانی کردووە و گوتوویە: إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ[4]، هەردەم دەڵێ: ئەی خەڵکینە! ئەوەی بەڵێنم داوە ڕاستە و هەرکەس چاکە کا، چاکەی تووش دێ و ئەوەش خراپە کا، خراپەی تووش دێ. ئەم بڕیارە ڕاستە و ئاگادار بن دونیا نەتانخاپێنێ و فریوی بەزەیی خودا نەخۆن.

## شرۆڤەی خۆ ویستی و دەرمانی

بزانە خۆویستان دزێون. ئەمانە کەسانێکن کە گومانی چاکە بە خۆیان و کردەوەکانیان دەبەن و لە زیانەکانی بێ‌خەبەرن. قەڵب و بێخەوش لێک جیا ناکەنەوە، چونکە پارەناسی چاک نین و فریوی ڕەنگ و ڕواڵەتیان خواردووە. یان ئەو کەسانەی کە پەرژاونەتە سەر زانست و پەرستنی خودا و خۆیان

١ ـ قورئان (٦/١١) هیچ گیانداریٚ نییە لە سەر زەویدا کە بژیوی لە سەر خودا نەبێ.

٢ ـ قورئان، ٣٩/٥٣. مرۆ بۆ خۆی خەبات نەکا، هیچ پاداشێکی پێ ناگا. (هـ)

٣ ـ نەفام ئەوەیە کە دەکەوێتە شوێن ئارەزووی نەفسی و چاوی لە خوایە.

٤ ـ قورئان، ٣٣/٣١.

لە ژێر چەتری هەوری ڕەشی گومڕایی دەرباز کردووە، لە سەدا نەوەدونۆیان بە خۆیان خەڕەن، بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «ڕۆژی پەسلان بە ئادەم دەڵێن لە زارۆکانت بەشی دۆژەەبکە لاوە». دەڵێ: «لە چەندا چەن؟» دەڵێن: «لە هەر هەزار کەس، نۆسەد و نەوەد و نۆ». ئەمانە وا نییە کە بۆ هەتا لە جەهەندەم بمێننەوە، بەلام ناچار دەبێ بەسەر دۆژەهدا تێپەڕن، چونکە ئەمانە بڕێکیان نەزان و پاژێکیان گومڕا و هەندێ هەڵخەڵەتاو و تاقمێ لەخۆبایی بوون و کۆتی ئارەزووەکانی نەفسیان کردۆتە ئەستۆ و چاکیش دەزانن کە هەڵە دەکەن. خۆویسان زۆرن و کارەکانیان لە هەژمارنایە، بەلام هەموویان لەم چوار چینە بە دەرنین: زانایان، عابدان، سۆفییەکان و خاوەن سامانان.

## چینی مرۆڤە خۆویستەکان

**چینی یەکەم** - زانایان؛ ئەو کەسانەی کە سەرلەبەری تەمەنیان خەریکی کۆوەکردنی زانست بوون، کەچی لە هەڵس‌وکەوتیاندا کەم و کورتن، دەست و زار و چاو و زک و ژێر زکیان لە گوناح نابوێرن و پێیان وایە لە زانستدا گەیشتوونە ئاستێ کە سزا نادرێن و لە هەڵس‌وکەوتیان ناپرسنەوەو تەنانەت زۆر کەس دەکەونە بەر تکایان و لە سزای جەحەننەم دەرباز دەبن؛ ئەمانە وەکی ئەو کەسەن کە نەخۆشی خۆی دەناسێ، دەواو دەرمانی دەزانێ و هەموو شەوێ سیایی دەرمانەکانی رادەنێ و یەک بە یەکیان دەخوێنێتەوە و مەرجەکانیان چا دەزانێ، کەچی قەد تۆزکاڵی دەرمان ناخوا و خۆ ناخاتە بەر ئازاری تفتی دەرمان؛ دەسا دوو پاتەکردنی ناوی دەرمان، چ قازانجێکی بۆ هەیە؟ خوداش فەرمووی: قَدۡ أَفۡلَحَ مَن [1]تَزَكَّىٰ دیسان دەڵێ: وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ، فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ [2]ٱلۡمَأۡوَىٰ، دەڵێ رزگار ئەوەیە کە پاکژ بێتەوە، نەک زانستی پاکژ بوونەوە بزانێ. ئەوەی دەڕواتە بەهەشت کە بە ئاوەژووی ئارەزووی نەفسی بزوێتەوە، نەک ئەوەی کە بزانێ دەبێ بە پێچەوانەی ئارەزووەکانی بجوێتەوە. ئەم دڵپاکە گەر ئەم بیرەی لەو خەبەرانەوە بۆ هاتووە کە لەمەڕ هێژایی زانست هاتووە، بۆچی ئەو خەبەرانەی لەسەر زانای ئاکار نزم هاتووە، ناخوێنێتەوە؟ خوا لە قورئاندا بە کەری چواندووە کە بارەکتێوی لە پشتە و بە سەگ چواندوویە و هەردەم دەڵێ زانای خراپ وا دەهاوێژرێتە دۆژەهەوە کە پشت و ملی دەشکێ و ئاور وای دەسووڕێنێتەوە کە کەر ئاش دەگەڕنی. خەڵکی دۆژەەلە دەوری کۆوە دەبن و دەڵێن: «تۆ کێی و ئەمە چ ئەنجامێکە تووشت بووە؟» دەڵێ: «من ئەو کەسەم کە

---

١ ـ قورئان (١٤/٨٧) دیاریشە هەرکێ پاک ژیا، رزگار بوو. (هـ)

٢ ـ قورئان (٧٩/٤٠، ٤١) بەلام کەسێ لە گەورەیی پەروەرندەی خۆی ترساوە، لە ئارەزووی دڵی خۆی وازی هێناوە، دیارە بەهەشت ئەنوای ئەوە. (هـ)

گوتم و خۆم نەمکرد».

پێغەمبەر فەرمووی: «رۆژی پەسلان، سزای کەس گەورەتر لە سزای ئەو زانایە نییە کە بە گوێرەی زانستی خۆی هەڵس‌وکەوتی نەکردووە».

ئەبوودەردا دەڵێ: «یەک جار وای بەحاڵی ئەو کەسەی کە نازانێ و حەفتا جار وای بەحاڵی ئەو کەسەی کە دەزانێ و بە پێی زانینی نابزوێتەوە؛ واتە زانست رێنمایە بۆی».

تاقمێ‌تر لە زانست و کردەوەدا کۆتاییان نەکرد، بەلام پەرژانە سەر رواڵەت و لە دەروونیان بێ ئاگا مان و ئاکاری نزمیان لە دڵ نەخستەدەر، وەکوو: لووت‌بەرزی و رژدی و مەرایی و حەز لە سەرۆکایەتی و خراپە ویستن بۆ خزم و کریڤان و شادبوون بەڕەنجیان و دڵتەنگ بوون بە شادییان. گوێیان بەم خەبەرانە نەدا کە دەڵێ تۆزکاڵێ مەرایی، ئامبازدانان بۆ خودایە و ئەوەی نەختێ خۆبەزلزانی لە دڵیدا بێ، ناکەوێتە ژێر سێبەری بەهەشت؛ هەروەها رژدی وەکوو چۆن ئاور هێزم دەسووتێنێ، باوەڕ دەفەوتنێ و دیسان دەڵێ پەروەردگار سەیری رواڵەتتان ناکا، بەڵکوو سەیری دەروونتان دەکا.

ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە شتێکی چاند بێ؛ دیارە بۆ ئەوەی بەرهەمێکی چاک و بە هێزی بێ، دەبێ لە هەرچی هەرزەگیایە بژاری کا، کەچی ئەم سەرچڵی گیا هەرزەکە دەبڕێ و دەس لە بنجی نادا و هەرزەگیاش بنج دادەکوتێ و پتر گەشە دەکا. بنج و بناوانی کردەوەی خراپ، ئاکاری خراپە و دەبێ هەر لە بنەوە دەربهێنرێ. ئەوەی رواڵەتێکی گونجاو و دەروونێکی پیسی هەیە، وەکوو پاکژکردنی جێگایە کە دەرەوەی بە گەچ هەنووبێ و ناوەوەی واز لێ هێنا بێ؛ یاخۆ دەرەوەی قەبری بە نەخش و نیگار خەملاندبێ، کەچی لە ناوەوە مردار هەبێ؛ یا خۆ ئەوەی کە مۆمیک لەسەر ماڵێکی تاریک هەڵکرابێ.

عیسا لە مەڕ زانای خراپکار دەڵێ: «وەکوو بێژنگ مەبن ئارد دابدا و سوەی تێدا بمێنێتەوە، ئەنگۆش پەیڤی ژیرانەتان لە دەم دادەبارێ‌و ئاکاری خراپتان لەدڵ دەمێنێتەوە».

تاقمێکی‌تر چا دەزانن ئاکاری خراپ، خراپە و دەبێ خۆی لێ ببوێرن و دڵی لێ پاکژ کەنەوە، بەلام پێیان وایە دڵیان لەم ئاکارانە پاک و بێخەوشە و ئەمان مەزنتر لەوەن داوێنی دڵیان بەم پیساییە پیس و گڵاو بێ، چونکە ئەم ئاکارانە لە هەرکەسی دی چاکتر دەناسن؛ کە ئاسەواری خۆبەزلزانی لە دڵیاندا چرۆی کرد، شەیتان پێیان دەڵێ: «ئەمە خۆبەزلزانی نییە، ئەمە لە راستیدا گەڕان بە دووی هێژایی دینە؛ گەر تۆ بەڕێز و هێژا نەبی، چجار ئیسلام هێژا نابێ. گەر بەرگی جوان دەبەرکەی و سواری ئەسپ بی و کەل‌وپەلی خەملێنەر چێژلێ بگری، دەڵێن: ئەمە لەبەر خۆویستی نییە، بەڵکوو بۆ کوێرکردنی چاوی دوژمنانی دینە، چونکە داهێنەران کە دەبینن زانایان بە شان‌وشکۆن، وەختە

کوێر بن». ڕەوشتی مستەفاو بووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی کە بە بەرگی کۆن و دڕاو دەژیان، لە بیر کەن و پێیان وابێ هەڵسوکەوتی ئەوان، سووکایەتی بە دین بووە و هەنووکە ئیسلام بەم خەملاندنەی ئەمان هێژا دەبێ. گەر ئیرەیی لە دڵیاندا سەر هەڵبێنێ، دەڵێن: ئەمە پتەوی و قایمی حەققە. گەر مەرایی بێتە دی، دەڵێن: ئەمە بۆ قازانجی خەڵکە تا بەندەگی من ببینن و چاوم لێ ببڕن؛ کە پەرایی خونکار دەکەن، دەڵێن: ئەمە مل‌کەچی لە ئاست خونکار نییە، چونکە ئەوە حەرامە، ئەمە بۆ تکاکاری موسوڵمانانە. گەر سامانی حەرام وەربگرن، دەڵێن: ئەمە چونکە خێوی نییە، حەرام نییە؛ ئەمە دەبێ بۆ ئاسوودەگی خەڵک‌وخوا و بۆ قازانجی ئیسلام خەرج بکرێ و قازانجی ئیسلامیش بە منەوە بەندیوارە. گەر دادوەر بێ و نەختێ بە خۆدا بچێتەوە و خۆی هەڵسەنگنێ، دەزانێ کە قازانجی دین لەوەدایە کە خەڵکی ڕوو لە دونیا وەگێڕن، کەچی کەسانێ کە لە سۆنگەی ئەوەوە ئامێزیان بۆ دونیا کردۆتەوە، پتر لەوانەن کە پشتیان لە دونیا کردووە. کەواتە، قازانجی ئیسلام لە نەبوونی ئەو و وەکوو ئەودایە. ئەم گریمانەو خۆهەڵخەڵەتاندنانە هەموویان پووچەڵن و دەرمانیان پێشتر بێژراوە و پێویست نییە لێرەدا جارێکی‌تر لێک بدرێنەوە.

تاقمێکی‌تر لە ناسینی خودی دیندا بە هەڵە ڕۆیشتوون و ئەو زانستانەی کە گرینگترن -وەکوو شرۆڤەی قورئان و ئەخبار و زانستی کردەی دڵ و ئاکار و ڕەوتی کۆشەوەو ئەوەی لەم پەرتووکەدا باس کراوە و زانستی دواڕۆژ و سوود و زیانەکانی ڕێگەی دین و چاودێری لە دڵ کە هەموویان فەرزی عەینن- فێر نەبووگن و نازانن ئەمانە زانستی بەڕاستین.

هەموو تەمەنیان بۆ جەدەڵ و شەڕەقسە و ڕکەبەرێ و دەمارگیری کەلامی یان فتوا لەسەر دوژمنایەتی دونیایی خەڵکی تەرخان کردووە و ئەو زانستانەی کە لە دونیاوە بەرەو دواڕۆژ، لە ڕژدیوە بەرەو چاوتێری، لە مەراییوە بەرەو بێخەوشی و لە بێ ئاگاییوە بەرەو وشیاری و پارێزکاری بانگێشتنی خەڵکی ناکەن، بۆتە کەڵکەڵەی بیر و هزریان و پێیان وایە کە زانست ئەمەیە و هەرکەس ئاوڕ لە چیدی بداتەوە، ڕووی لە زانست وەگێڕاوە و دەگەڵ زانست سەرگران بووە.

ڕاڤەی ئەم گریمانانە دوور و درێژە و لە باسی «غروور» لە کتێبی ئەحیادا بە وردی باس کراوەو لەم پەرتووکەدا جێگەی وردبوونەوەی نییە.

تاقمێکی‌تر پەرژاونەتە سەر زانستی بێژەری و سەر لە بەری پەیڤیان شیعر و تاماتی بێواتایە و دۆزیان لەم باسانە ئەوەیە کە خەڵکی نەعرەبکێشن و پەسنیان بکەن. تێنەگەیشتوون کە مەبەستی سەرەکی لە ئاگادار کردنەوە ئەوەیە کە ئاورێک لە دڵ و دەروون بەر بدەن تا مەترسی دواڕۆژ خویان بکەن؛ کەواتە خەریکی لاواندنەوەی ئەم کارەساتە دەبن و بیرخستنەوە و ئاگادار کردنەوە و ئاخاوتن، نەوحەی ئەم کارەساتەیە. بەڵام لاواندنەوەیەک کە خەم و پەژارەی تێکەڵ نەبێ، لە شات‌وشووت

بەولاوە چیدی نییە و لە هیچ دڵێکدا کاریگەر نابێ. بە هەڵە ڕۆیشتووانی ئەم تاقمەش زۆرن و ڕاڤەی ئەم باسەش درێژە.

تاقمێ‌تر لە سای فیقهی ڕواڵەتدا دەژین و نەیانزانیوە کە ئاستی فیقەپتر لەوە نییە کە ئەو یاسا کە خونکار خەڵکی پێ دادوەری دەکا، بپارێزن. بەڵام ئەوەی پێوەندی بە ڕێی دوارۆژەوەیە، زانستێکی-ترە، کەچی ئەمان وادەزانن هەرچی بە فیقهی ڕواڵەت ڕاست و دروست بێ، لە دوارۆژدا زۆر بە نرخە. وەکوو ئەوەی کەسێک لە کۆتایی ساڵدا سامانەکەی بداتە ژنەکەی و لە پشتی ساڵ لێی بسێنێتەوە، فتوای ڕواڵەتی شەرع دەڵێ کە زەکات لە کۆڵی هەر دوویان دەکەوێ؛ واتە کۆکەرەوەی زەکاتی خونکار بۆی نییە زەکاتیان لێ بسێنێ، چونکە ساڵێک بەسەر سامانەکەیدا نەهاتووە. ڕواڵەتی شەرع سەیری ڕواڵەتی سامان دەکا کە ساڵێکی بە سەردا نەهاتووە. ڕەنگە بە گوێرەی ئەمە فتوا بدات و نەزانێ کە لە ڕاستیدا ئەم کەسە دەکەوێتە بەر تووڕەیی خودا و وەکی ئەو کەسەیە کە زەکات نادات. چونکە ڕژدی و چنۆکی کوشندەیە و زەکات پاکژ کردنەوەیە لە پیسایی ڕژدی. ڕژدییەک کوشندەیە کە گوێ بۆ ڕاگیرێ، ئەم فێڵەش کەوتنە دووی ڕژدییە؛ کەواتە، کە بەم چەشنە فەرمانی ڕژدی بەجێ‌هێنرا، تەواو خۆی کوشتووە، چۆن دەرباز دەبێ؟

هەروەها پیاوێک کە ئازاری خێزانی بدات بۆ ئەوەی مارەیی خۆی پێی ببەخشێ، لە ڕواڵەتی شەرعدا ئەم بەخشینە درووست و بێ هەڵەیە، چونکە دادوەری ئەم جیهانە ڕاستی بە گوێرەی قسە دەنرخێنێ، نەک بە گوێرەی دڵ؛ کەچی لەو جیهاندا لەسەر ئەوە لێی دەپرسنەوەو تۆڵەی لێ دەستێننەوە، چونکە بەخشینی مارەیی بە زۆر بووە، نەک بەویستی خۆ.

هەروەها بەراشکاوی تشتێک لە کەسێک بخوازێ و ئەو کەسە لەبەر شەرم و شوورەیی بیدات؛ ئەمە لە فتوای ڕواڵەتدا ڕەوایە، کەچی لە ڕاستیدا داگیرکردن و بە زۆر ئەستاندنە؛ چونکە هیچ جیاوازی نییە لە نێوان ئەو کەسەیدا کە بە قەمچی شەرم شتێکی لێ دەستێنن و ئەو کەسەی کە بە دار ئێێ بدەن و بە زۆری زۆرداری شتێکی لێ داگیر بکەن.

شتی وا زۆرە و ئەوەی بە تەنیا فیقهی ڕواڵەتی خوێندبێ، لەم گریمانەدایە و ئەم وردەکارییانەی نهێنیەکانی دین ناناسێ.

**چینی دووهەم** - عابد و زاهدانن، لەمانەشدا هەڵخەڵەتاو گەلێک زۆرن:

تاقمێک کەسانێکن کە بە بۆنەی ئاکاری چاکەوە وازیان لە فەرزەکان هێناوە و بەمە ڕاستەڕێیان لێ تێکچووە؛ وەکوو ئەوەی کەسێک لە تارەتدا تووشی وازوازی بێ، تا نوێژەکەی دەفەوتێ و بە توندی دەگەڵ دایک و باوک و دۆستی دەدوێ و گومانی دوور لە مەڕ پیس بوونی ئاو، لە لای ئەو نزیک بێ. کە دەگاتە خواردن، هەموو شتێ بە پاک دەزانێ و ڕەنگە لە حەرامی ئاشکراش خۆ نەبوێرێ، کەچی

پای بێ پالا نەنێتە سەر خاک و حەرام بخوا و ڕەوشتی پەیغەمبەر و یارانی لە بیر باتەوە، چونکە عومەر دەیگوت: «حەفتا جار وازم لە حەلاڵ هێنا، لە ترسی تووشیاری حەرام هاتن»، کەچی لە گۆزەی ژنی مەسیحی دەسنوێژی دەشوشت. بەڵام ئەم تاقمە فەرزی چاودێری بەسەر پاکی جێگەیان داوەتە سەر پاکی پاروودا و گەر کەسێک جلکێ کە جلشۆر شۆردبێتی بکاتە بەر، پێیان وایە گوناحێکی ئێجگار گەورەی کردووە.

پێغەمبەر جلکێ کە کافرەکان بۆیان دەنارد، دەیکردەبەر و هەر بەرگێ کە بە دەسکەوت لە شەڕی کافراندا بەری دەکەوت، دەیکردەبەر و کەس نەیگێڕاوەتەوە کە بە ئاو شوشتبێتی و نوێژی کردبێ، تەنانەت چەکی کافرەکانی دەبەست و نوێژی پێ دەکرد و نەیدەگوت کە ئاو بەم شیرەدا بدەن، یا خۆ پێستێ کە چێ کرابێ، نەیگوتووە نەکوا نوێژی نەکرابێ. کەواتە ئەوەی چاودێری لە پاکی وردگ و زمان و دەست و پێ و ئەندامانیتر نەکردبێ، خۆی کردۆتە گەپچاڕی شەیتان؛ ئەوەش لە ڕاگرتنی پاکیدا و لە ڕشتنی ئاودا زێدەڕۆیی کا، تا ئەوەی نوێژی بفەوتێ، هەڵخەڵەتاوەو ڕێی لێ تێکچووە. مەرجەکانی ئەم چاودێرییەمان لە بەشی تارەتدا گوتووە.

تاقمێتر لەسەر نییەتی نوێژ وازوازین و بانگ هەڵدەبڕن و دەست ڕادەوەشێنن و ئەوەندە تووشی دڵەراوکێ دێن ڕەنگە زۆر جار ڕەکاتی یەکەمی نوێژی جەماعەتیان بفەوتێ. ئەمانە نازانن نییەتی نوێژ، وەکوو نییەتی قەرزدانەوەو زەکات دانە. کەس لەمانەدا قەد ناڵێ لە نییەتی قەرزدانەوە یا خۆ زەکات داندا تووشی وازوازی هاتم و جارێکیتر نایداتەوە.

تاقمێتر لەسەر چۆنییەتی گوتنی پیتەکانی سوورەی ئەلحەمددا تووشی وازوازی دەبن و سەرلەبەری نوێژیان لەم بیرەدان کە چۆن دەتوانن ئەو پیتانە بە چاکی بڵێن. ئەم کەسە دەبێ دڵی بە واتاکان بسپێرێ، تا کاتێ دەڵێ: «اَلْحَمْدُ لِلّه» هەموو گیانی شوکرانەبژێری بێ و کاتێ دەڵێ: «اِیّاکَ نَعْبُدُ وَ اِیّاکَ نَسْتَعِینُ» هەموو گیانی تاکپەرستی و مل کزی بێ و لە کاتی گوتنی «اِهْدِنا»دا دڵی بێتە کوڵ، کەچی ئەم کەسە دڵی لەسەر ئەوەیە کە کاتێ دەڵێ «اِیّاکَ» دەنگەکە لە شوێنی خۆیەوە دێتە دەر یا نە؛ هەر وەکوو ئەو کەسەی کاتێ داواکارییەکی لە پادشایەک هەیە و دەڵێ: «ئەزبەنی» و کاتێ دەیەوێ نیازەکەی بڵێ، بیری لە لای ئەوە بێ کە بە جوانی وشە و پیتەکان بڵێ؛ بێگومان ئەم کەسە شیاوی تووڕەبوون و زللەیە.

تاقمێتر ڕۆژێ خەتمێ قورئان دەخوێنن و بەسەر زارەکی و بلەز و بەز دەیلێن و دڵیان لێی بێ-ئاگایە. هەموو کۆشەوەی ئەم کەسانە ئەوەیە کە شانازی بە خۆ بکەن، کە چەن جار دەورەی قورعانمان کردۆتەوە و ئەمڕۆ چەن بەش لە قورعانمان خوێندووە، کەچی نازانن ئەم قورعانە نامەیەکە بۆ خەڵک نووسراوە و تێیدا فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە و ترسانن و مزگێنی و ڕاوێژ و

مۆچیاری و بیرخستنەوە هەیە و دەبێ هەموو گیانیان لە کاتی هەڕەشەدا ببێتە ترس و لە کاتی مزگێنیدا ببێتە شادی و لە کاتی ئامۆژگاریدا بە دڵ گوێی لێ بگرن و لە کاتی ترساندندا دڵیان تڕی لە سام بێ. ئەمانەش هەموو حاڵی دڵە، لێو جووڵاندنەوە چ قازانجێکی بۆ هەیە؟ ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە خونکارێک نامەیەکی بۆ نووسیوە و تێیدا دەستوور و فەرمانی زۆری نووسیوە، کەچی ئەم کەسە سەرلەبەری نامەکە ئەزبەر دەکا و هیچی لێ تێناگا، تەنیا ئەزبەری[1] دەکا. جا ئەوە چ کەڵکێکی بۆ هەیە؟

تاقمێ دەڕۆنە حەج و لەوێ مەنزڵ دەکەن و ڕۆژوو دەگرن، کەچی نە ڕێزی ڕۆژووەکەیان دەگرن بە پاراستنی دڵ و زمانیان، نە حورمەتی مەککە ڕادەگرن؛ نە بە دابین‌کردنی توێشووی پاکژ و حەڵاڵ مافی ڕێگا بەجێ‌دێنن، بەردەوام دڵیان لە لای خەڵکە کە بە دانیشتووی لای ماڵی خودایان بزانن و دەڵێن: ئێمە لە چەندین «موقف» دا وەستاوین و چەن ساڵ لەوێ دانشتووین؛ بەڵام لەمە نەگەیشتوون کە مانەوە لە ماڵی خۆ بە هیوای ڕۆیشتنە حەج، هێژاترە لەوەی لە حەجدا بن بە هیوای سەرنجی خەڵکی و چاو لە دەستی خەڵکی ببڕن کە بەشکوو شتێکیان پێ بدەن و بەوەش تووشی ڕژدی و چنۆکی دەبن کە نەکوا کەسێک لێیان بستێنێ.

تاقمێکی‌تر ڕێگای دوورەپەرێزی دەگرنە بەر و کەڵپۆس دەکەنە بەر و خۆراکی کەم دەخۆن و ماڵی کەم کۆوە دەکەن، کەچی لە پلە و پاگەدا پارێزکار نین؛ خەڵکی بە مفەڕکیان دەزانن و ئەمانیش پێی شاگەشکە دەبن و خۆیان لە پێش چاوی خەڵکدا بە پارێزکار دەنوێنن و نازانن زیانی پلە و پاگەیان گەلێک لە ماڵ‌وسامان زۆرترە و وازلێهێنانی دژوارترە؛ چونکە هەموو ئازارێک بە هیوای گەیشتن بە پلە و پاگە ئاسان دەبێ. پارێزکار ئەوەیە کە لە ناوبانگ دوور بگرێ و ڕەنگە کەسێک شتێکی پێ بدا و ئەم لێی وەرنەگرێ تا نەڵێن پارێزکار نییە. گەر پێی بڵێن «وەریبگرە و پاشان بە نهێنی بیدەرە هەژارێک» لە کوشتن پێی دژوارترە، هەرچەند حەڵاڵیش بێ. چونکە ئەودەم مەردم پێیان وایە کە پارێزکار نییە و بەم بۆنەوە وا دەزانن ڕیزی دەوڵەمەندان پتر لە هەژاران دەگرێ و ئەمەش خۆ فریودانەو بەس.

تاقمێکی‌تر سەرلەبەری کردەوە ڕواڵەتییەکان بەجێ‌دێنن، وەکوو ئەوەی ڕۆژی هەزار ڕەکات نوێژ دەکەن، چەن هەزار تەسبیحات دەکەن، شەو تا بەیانی شەونوێژ دەکەن، بەیانیش بە ڕۆژوون، بەڵام ئاگاداری دڵیان نین تا لە ئاکاری خراپی پاکژ کەنەوە و دەروونیان تەژی لە خۆبەزلزانی و ڕژدی و مەرایی و ئێرەییە.

زۆربەی ئەم کەسانە دەگەڵ خەڵکی ناوچاوتاڵ و دەمار گرژ و تووڕە و مۆنن و دەگەڵ بەندەکانی

---

1- ئەزبەر: فێربوون.

خودا بە توندی دەپەیڤین و دەڵێی لەگەڵیان شەڕیانە. کەچی نازانن رووی گرژ، هەموو عیبادەتێ بە خەسار دەدا و ترۆپکی هەموو عیبادەتەکان رووی گەش‌وخۆشە و ئەمانە پێیان وایە چونکە عیبادەت دەکەن، دەبێ منەتی بەسەر خەڵک‌وخوادا بنێن و بە سووکی سەیری هاوالانیان کەن و خۆ لە خەڵکی هەڵاوێرن تا پێیانەوە نەنووسن. نازانن کە سەرۆکی هەموو پارێزکاران و پارساکان مستەفا بووە، رووی لە هەموو کەس گەشتر و کراوەتر بوو، کەچی ئەو کەسەی جلکی پەرپووتتر و دڕاوتر بایە و هەمووان خۆیان لێ دوور بگرتایە، دەیهێنایە لای خۆی و دەستی رادەکێشا، جا کام نەفام و هیچ نەزانە کە خۆی سەرتر لە سەرۆکی پارێزکاران بزانێ؟ ئەم دڵپاکانە چۆن رێبازی مستەفا دەگرنە بەر و رەوشتی ئەو واز لێ دێنن، چ گەوجییەک لەمە خراپترە؟

**چینی سێهەم** - سۆفییەکانن؛ لە نێو هیچ تاقمێکدا پتر لەم کەسانە هەڵخەڵەتان نییە، چونکوو هەرچی رێگا تەسکتر و ئاستەمتر بێ، فێڵ و گومڕایی و لە راستەڕێ لادان فرەترە. سەرتای سۆفێتی ئەوەیە کە گەیشتبێتە سێ ئاست:

**یەکەم** - ئەوەی کە نەفسی خۆی هێنابێتە ژێر رکێفی و لە هەرچی ئارەزوو و تووڕەییە پاکژی کردبێ؛ نەک ئەوەی لە بناوانەوە نەیهێشتبێ، بەڵکوو کۆتی بەندەیی لەمل کردبێ تا لە راستەڕێ کلانەبێ و لە فەرمانی شەرع لانەدا؛ وەکوو شوورەیەک کە گیرابێ و خەڵکەکەی دەستەمۆ و گەردەن کەچ کرابن و نەکوژرابن؛ دەبێ قەلای دڵی بە دەستی خونکاری شەرع داگیر کرابێ.

**دووەم** - ئەوەی کە ئەم جیهان و ئەو جیهانی لەبەر هەڵگیرابێ؛ واتە لە جیهانی هەست و خەیاڵ تێپەڕابێ، چونکە هەرچی بە هەست و خەیاڵدا تێپەڕی، ئاژەڵانیش دەگەڵی هاوبەشن و سەرلەبەری بەشی زگ و ژێر زگ و لەشە. بەهەشتیش لە جیهانی هەست و خەیاڵ بەدەر نییە. هەرچی رەهەند و لایەنی هەبێ و پێوەندی بە خەیاڵەوە بێ، لە لای وی وەکوو گیا و روەکە لە لای ئەوەی حەڵوا و مریشکی برژاوی لەسەر خوان بێ؛ چونکە دەزانێ هەرچی هی خەیاڵ بێ، سووک و بێفەڕە و بەشی خەڵکی ساوێلکەیە «وَ اَكثرُ اَهلِ الجنّة البُلهُ».

**سێهەم** - گەورەیی و جوانی پەروەردگار، سەرلەبەری گیانی داگرتبێ. ئەمە ئەو شتەیە کە رەهەند و شوێن و هەست و خەیاڵ لێی تێناگەن؛ تەنانەت خەیاڵ و هەست و زانست کە لەم بناوانەوە سەرچاوە دەگرن، ئەوەندە پێوەندییان پێیەوە هەیە کە چاو بە دەنگ و گوێ بە رەنگ، چونکە ئەمانە وا رسکاون کە هیچ لە یەکتری نەگەن. کە گەیشتە ئەم ئاستە، گەیشتۆتە سەر کۆڵانی سۆفێتی و ئەو

پەڕی ئەم کۆڵانە، مەقامات[1] و ئەحواڵی[2] سۆفییە لەگەڵ پەروەرندەی کە باس لێکردنی گەلێک ئەستەمە؛ بە چەشنێ کە برێ کەس کاتێ باس لە سۆفێتی دەکەن، بە یەکەتی و برێکیش بە دۆنادۆن ناوی دەبەن. ئەوەی لە زانستی ئەم ڕێبازە شارەزا نەبێ و ئەم حاڵەی بۆ بێتە ئاراوە و لە ڕاستەقینەی تێنەگا، هەرچی دەڵێ بە ئاشکرا کفرە. ئەمە لە خۆیدا ڕاستە، بەڵام خوستی ڕاڤەی نییە. ئەمە وێنەیەک بوو لە ڕێگەی سۆفێتی.

جا ئێستا سەیرکە با گریمانە و هەڵخەڵەتانی کەسانیتر ببینی، بە چەشنێ کە هەندێکیان لە کەڵپۆس و بەرماڵ و پەیڤی تامات بەو لاوە چیتر نازانن، چونکە ئەمانە بە تەنیا جلوبەرگ و ڕواڵەتی ژینی پارێزکارانیان هەڵبژاردووە. وەکوو ئەوان لەسەر بەرماڵ ڕۆدەنیش، سەری سڕدا دەخەن و وادەنوێنن کە خەریکی بیر و ویرن، گەر وازوازی و خەیاڵێکی خاویان بۆ بێتە دی، سەر دەجووڵێننەوە و پێیان وایە کە کاری ئەوان ئاوەهایە. ئەمانە وەکی ئەو پیرەژنە پیر و پەککەوتەیەن کە کڵاو دەنێتە سەر و عابا دەکاتە بەر و شیر دەبەستێ و لەنجە و لار و ڕێگەڕۆیین و هەڕەشە و گوڕەشەی سەربازان فێر بووە و دەڕواتە لای خونکار تا ناوی ئەمیش لە ریزی شەڕکەراندا بنووسێ. خونکار سەیری جلوبەرگ ناکا، دەفەرمێ تا رووتەوەبێ و بڕواتە مەیدان و دەگەڵ شەڕکەریتر بە شەڕبێ. کە خۆی رووتەوە دەکا، چ دەبینن؟ پیرەژنێکی بێهێز و وزە و پیر و پەرتووت و پەککەوتە دەبینێ کە تەنانەت ڕێگا ڕۆیینی پێ دژوارە؛ بۆیە دەفەرمێ تا بیخەنە بەر پای فیل با ببێتە پەندێ بۆ کەسانیتر کە بە تەمای خاپاندنی خونکار نەبن.

تاقمێکیتر لەمانە خراپترن، چونکە ئەوە ئەوانەی پێشوو دەیکەن، پێیان ناکرێ. ئەمانە ڕواڵەت رادەگرن و بەرگی کۆن و دڕاو دەبەر دەکەن و فۆتەی باریک و شتی وا دەکەنە بەر و پێیان وایە هەر ئەمەیان بۆ بەستە. کەچی نازنن بۆیە بەرگی ڕەش دەکەنە بەر تا کەمتر پیسایی و چڵکی لێ دیار بێ و دێر بە دێر بیشۆن، هەروەها بۆیە بەرگی شین دەبەر دەکەن کە پیشان بدەن ئازیەبتاری کارەساتێکن کە بەسەر دیندا هاتووە. ئەم گوناحکارانە چونکە زۆر خەریکی بیر و ویر نین تا شوشتنی جلکەکانیان لە بیر بچێ و کارساتێکیان بە سەردا نەهاتووە تا جلکی شین دەبەرکەن و زۆر پارسەک نین کە جلکەکەیان دڕا، پینەی بکەن، بۆیە فۆتەی نوێ دێنن و دەیدڕن تا پینەی کەن. ئەم نەزانانە تەنانەت لە ڕواڵەتیشدا ناتوانن چاو لە پارێزکاران ببڕن، چونکە یەکەم کەس کە بەرگی پینەکراوی کردە بەر، عومەری خەتتاب بوو؛ کراسەکەی چواردە بینە پێوە بوو.

---

١ ـ مەقام: بریتییە لەو پلە و پاگە و مەنزڵگایەک کە بەندە بە هۆی کێشانی ڕەنج و ئازاری فراوان و بە بۆنەی جێ بە جێ‌کردنی هەندێ داب و نەریتی تایبەتەوە پێی دەگا.

٢ ـ خواناسان هەرچی لە سۆنگەی بەزەیی پەروەردگارەوە بە بێ تەقالای خواناس بگاتە دڵی ڕێروی ڕێی خوا کە بەسەر هەڵدانی دانستەگەلی ئینسانی لە ناو دەچێ، دەڵێن حاڵ. کە حاڵ بەردەوام مایەوە و بە سەر دڵدا دا سەپا، دەبێتە مەقام.

تاقمێکی‌تر لەمانەش خراپترن. ئەمانە ناتوانن بەرگی دڕاو و هەژارانە بکەنە بەر و لەبەر لەش‌گرانی نە فەرزەکانیان بە جێ دێنن، نەش واز لە گوناح دێنن و نەش دەتوانن دان بە سستی خۆیاندا بنێن و بڵێن یەخسیری دەستی نەفسی پەستین. دەڵێن: کار هی دڵە نەک ڕواڵەت. دڵی مە بەردەوام دەگەڵ خودایە و لە نوێژایەو هیچ پێویستمان بەم کردانە نییە؛ چونکە ئەم کۆشەوانە بۆ کەسانێکە کە لە دەستی شاوەت و ئارەزووەکانی نەفسدا یەخسیرن، بەڵام نەفسی ئێمە مردووە و دینی ئێمە دوو مەشکە[1]یە و بەم شتانە لە نوێژ ناچێ و ئاڵ و وێری بە سەردا نایێ. کە سەیری پارێزکاران دەکەن دەڵێن: ئەمانە کرێکارانی بێ کرێن. کە سەیری زانایان دەکەن، دەڵێن: «ئەمانە کەوتوونەتە نێو بەندی حەدیس و ڕێگای ڕاستەقینەیان لێ داخراوە». ئەم تاقمە شیاوی کوشتنن و لە ڕیزی کافرانن و بە ڕای نەتەوەی محەممەد، خوێنیان حەڵاڵە.

تاقمێکی‌تر پەرای سۆفییان دەکەن. ڕاستەقینەی خزمەت ئەوەیە کە ئەو کەسە خۆی و ماڵوسامانی بۆ ئەم تاقمە بەخت کاو بە گشتی لە ڕێێ خۆشەویستی ئەم کەسانەدا، خۆی بە تەواوی لە بیرکا؛ کەچی ئەم کەسانە سۆفییەکان دەکەنە وەک دووکانێ تا خۆیانی پێ تەیار کەن و ماڵوسامان کۆوە کەن و بیانکەنە پێڕەوی خۆ و ناوبانگی خۆیان بۆ پەرای سۆفییان بە دونیادا بڵاو کەنەوەو لە نێو خەڵکدا ڕێز و حورمەت بە دەس بێنن و لە هەر کوێ بێ -حەڵاڵ یان حەرام- پارە دەستێنن و پێیان دەدەن تا بازاڕیان نەفەوتێ و کەس نەزانێ ئەمانە خاپێنەری هەڵخەڵەتاون.

تاقمێکی‌تر هەن کە ڕێبازی کۆشەوە[2] و دوورەپەرێزی بە تەواوی دەبڕن و شاوەتەکانی خۆیان سەرکوت دەکەن و هەموو گیانیان دەدەنە دەست پەروەرندەیان و لە سووچێکدا خەریکی بیر و ویر دەبن و حاڵیان گۆڕانی بە سەردا دێ، بە چەشنێک کە لە هەرچی بیانەوێ، ئاگادار بنەوە. گەر کورتییەک کەن، تەمێ دەکرێن و ڕەنگە فریشتەکان و پێغەمبەران بەوێنایەکی بەدەو ببینن و تەنانەت ڕەنگە خۆیان لە تەشقی ئاسماندا و لە کاتی سەیری فریشتەکان ببینن. ڕاستەقینەی ئەمە هەرچەن ڕاستە، وەکی خەونێکە ڕاست و دروستە. خەڵکی بە خەون ئەم شتانە دەبینن، کەچی ئەمان لە خەوەریدا دەیانبینن. بەڵام بەم داڵغەیە بە خۆ خەرە دەبن. چونکە دەڵێن: هەرچی لە حەوت ئاسمان و زەویدایە بۆیان ڕانام. وا دەزانن کە ئەو پەڕی کاری دۆستانی خودا هەر ئەمەیە، کەچی بە قەدەر تۆزکاڵێ لە سەیر و سەمەرەکانی ئافرێندراوانی خودای نەدیوە. پێیان وایە سەر لە بەری بوون ئەوەیە کە پێی نوێندراوە، کە ئەم دۆخەی بۆ هاتە گۆڕێ، وا دەزانێ کە تەواو بووە و لەبەر

---

۱ ـ دوو مەشکە: قلتین. دوو قوللە.

۲ - کۆشەوە: مجاهدە.

خۆشی و شادی و شاگەشکە بوون، لەمە سەرتر ناڕوا. ڕەنگە ئەو نەفسەی کە لە کۆت کرابوو، هێواش هێواش خۆی دەربازکا و کۆتی بەندەیی لە ملی کا، کەچی ئەم پێی وایە چونکە ئەم شتانەیان پێ نواندووە، نەفسی لە بەندایە و دەرباز نابێ و گەیشتۆتە دوایین ئاستی پارێزکاری. ئەمە هەڵخەڵەتانێکی ئێجگار گەورەیە و نابێ هیچ لێی ئارخەیان بی، دەبێ لە کەسێک دڵنیابی کە ناخی گۆڕاوە و گوێڕایەڵی شەرع بووە و دانستەکانی لە ژێر دەسەڵاتی خۆیدا نەماوە و بە تەواوی لە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی پەروەرندەی دایە.

شێخ ئەبولقاسمی گورگانی گوتوویە لەسەر ئاودا ڕۆیشتن و بە ئاسماندا فڕین و لە نهێنی خەبەردان، هیچ گەورەیی نییە؛ گەورەیی ئەوەیە کە بەندە بە تەواوی گوێڕایەڵ و ملکەچی پەروەرێنەری بێ و هەموو گیانی لە ژێر فەرمانی خودادا بێ و ئەوەی وابوو، شیاوی متمانەیە. بەڵام ئەویتر ڕەنگە هی شەیتان بێ، چونکە شەیتانیش لە نهێنیەکان ئاگادارە. کەسانێک هەن کە کاهینیان پێ دەڵێن، ئەمانەش لە نهێنی ئاگادارن و شتی سەیر و سەمەرەی زۆر دەبینن. دەبێ بەوە متمانەکەی کە هەم خۆی و نیازەکانی نەمێنن و لە جێگایان شەرع دابنێ. گەر نەتوانی سواری پشتی شێر بی، هیچ خەم مەخۆ، گەر ئەو سەگی تووڕەییە کە لە سنگتدایە کەوی کەی و بیهێنیتە ژێر ڕکێفت، سواری شێری. گەر ناتوانی لە نهێنی هەواڵ بدەی، هیچ خەم مەخۆ، گەر کەمایەسی و نوقسانی خۆت -کە هی نەفسە- ناسی و لە زیان و گزییەکانی ئاگەدار بووی، نوقسانی تۆ، نهێنی تۆیە، لە نهێنی ئاگەداری. گەر ناتوانی بەسەر ئاودا بڕۆی و لە ئاسماندا بفڕی، خەمت نەبێ، گەر لە دەرەوەی هەست و دالغەت مەنزڵگایەکت دیبەوە و بۆ ئەوێ ڕۆیشتی، بەسەر ئاودا ڕۆیشتووی و لە ئاسماندا فڕیوی.گەر ناتوانی بە شەوێ ساراکان ببڕی، خەمت نەبێ، کە مەنزڵگاکانی دونیات پێوا و بیر و دڵەڕاوکێی دونیات خستە پشت گوێ، سارات بڕیوە. گەر ناتوانی بە جارێ پێ بنیتە سەر دوندی کێوێ، خەمت نەبێ، گەر بتوانی پێ بەسەر درهەمێکی گوماناویدا بنێی، ڕێێ هەڵەتت بڕیوە، چونکە پەروەردگار لە قورعاندا بەڕێی هەڵەت ناوی بردووە، هەروەک دەڵێ: فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ۝ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ.[1] ئەمەی بێژرا هەندێ لە هەڵەکانی ئەم تاقمە بوو و پتر لەمە درێژە دەخایەنێ.

**چینی چوارەم** - دەوڵەمەندان و خودانی ماڵوسامانن. خاپێنراو و ڕێبزرکردوو لەم خێڵەدا گەلێک زۆرە، چونکە بڕێکیان ماڵێک کە لە حەرام بە دەسیان هێناوە، بۆ کردنەوەی مزگەفت و کاروانسەرا و پردی خەرج دەکەن، کەچی فەرز ئەوەیە بیگێڕنەوە بۆ خێوەکانی. دەیکەنە بینا تاکوو گوناحەکانیان فرەتر بێ و کەچی خۆیان وا دەزانن کارێکی چاکیان کردووە.

---

١ ـ قورئان (٩٠/١١ و ١٢) وەلێکان ئەو خۆی لە ڕێی هەڵەت نادا، کوو دەزانی مەبەس لە ڕێێ هەڵەت چییە. (هـ).

تاقمێ هەن کە لە حەلاڵ خەرج دەکەن، بەڵام مەبەستیان چاوە و ڕووبینییە، کە درهەمێ خەرج دەکەن، دەیانەوی جاڕ بدەن و ناوبانگی خۆیان بە دونیادا بڵاو کەنەوە و لە نێو کەرپووچدا ناوی خۆیان هەڵدەکۆڵن. گەر پێیان بڵێن: ناوی خۆت مەنووسە، یا خۆ ناوی کەسێکیتر بنووسە، خودا دەزانێ کاری کێ بووە، گوێیان کپ و کەڕ دەبێ. نیشانەی ئەوەی کە ئەمانە ڕووبینی دەکەن ئەوەیە کە ڕەنگە لە دراوسێیاندا پارسەک و بە لەنگازی زۆر هەبێ کە نانی شەویان نەبێ، ئەم پارەتییە بۆ ئەوان فەرزتر و هێژاترە، کەچی ناتوانن پێیان بدەن، چونکە ناتوانن جەمینیان هەڵکۆڵن و لە سەری بنووسن: «بَناهُ فلان، اَطال اللّهُ بَهائَهُ[1]».

تاقمێتر ماڵی حەلاڵ بێخەوشانە خەرج دەکەن، بەڵام دەیکەنە نەخش و نیگاری مزگەوت و پێیان وایە کاری چاک دەکەن. کەچی ئەم کارەیان دوو خراپەی تێدایە: **یەکەم**، دڵی خەڵکی لە کاتی نوێژدا دەپەرژێتە سەر ئەو جوانکارییانەو هەستی بەندەگی لە دڵیاندا نامێنێ. **دووەم** ئەوەیە کە خەڵکوخوا پێیان خۆشە خانووەکانی خۆیان وابخەملێنن و دونیایان لەبەر چاو هێژا دەبێ، کەچی ئەم کەسە پێی وایە چاکەی کردووە.

پێغەمبەر فەرمووی: «وای لە ئەنگۆ، گەر مزگەوتەکانتان بنەخشێنن و قورعانەکانتان بە زێر و زیو بخەملێنن». ئاوەدانی مزگەوت بەو دڵە تەیارو مل‌کەچ و گوێڕایەڵانەیە کە بێزیان لە دونیا دێ، کەچی هەرچی تەگەرە بخاتە نێو ئەم ئاوەدانییە، دەبێتە هۆی کاولی مزگەوت. ئەم نەزانە، مزگەوتیکی تێکدا، کەچی پێی وایە کاری چاکی کردووە.

تاقمێکیتر پێیان خۆشە هەزاران لەبەر دەرکیان کۆوە بن تا قوو بخەنە نێو شار کە خێر دەدەنە هەژاران، یا خۆ پێیان خۆشە سەدەقە بدەنە کەسانێک کە لە نێو خەڵکدا بەناوبانگن، یاخۆ پارە بۆ کەسانێ خەرج کەن کە لەڕێی حەجدا خەرجی دەکەن، یاخۆ لە خانەگایەک کە خەڵک پێی بزانن و بە چاکی ناوی بەرن. گەر پێیان بڵێی چاتر وایە ئەم پارەیەت بەنهێنی بۆ هەژارێ خەرج کەی، تا ئەوەی کە لە ڕێی حەجدا، چجار ناژنەفێ و چونکە چێژی وی لە پەسن و تاریفی خەڵکایەو بۆ خۆیشی وادەزانێ چاکەی کردووە.

یەکێک بۆ ڕاوێژ هاتە لای بێشری حافی و گوتی: «دوو هەزار درهەمی حەلاڵم هەیە، دەمەوێ بڕۆمە حەج». گوتی: «بۆ سەیران دەڕۆی یان ڕەزای خودا؟» گوتی: «بۆ ڕەزای خودا». گوتی: «کەواتە، بڕۆ بێدەرە قەرزاران وسێوی و خێزانداران؛ چونکە ئەو قازانجەی بە موسوڵمانانی دەگەینی لە سەد حەج هێژاترە، پاش حەجی ئیسلام». گوتی: «زۆرتر حەز بە حەج لە دڵمدایە»و گوتی:

---

[1] - فلان کەس ئەم بینایەی کردۆتەوە، خوا تەمەنی درێژکا!

«چونکە ئەم سامانەت لە ڕێگەی نابەجێ بەدەس هێنــاوە، تـا لـە ڕێگـەی نابـەجێ خـەرجی نەکـەی، نەفست ئۆقرە ناگرێ».

تاقمێ ئەوەندە ڕژدن کە پتر لە زەکاتیان نادەن. ئەوسا ئەو زەکات و دەیـەکانـە دەدەنـە کەســانێک کە پەرای خۆیان دەکەن (وەکوو مامۆستا و شاگرد) تاگەورەیی و شان‌وشکۆیان لە نێـو ئـەم کەســانەدا بەردەوام بێ؛ وەکوو مامۆستا کە زەکاتەکەی دەداتە خوێنـدکارانی و گـەر واز لـە دەرســی وی بێـنن، پێیان نادا؛ کەچی ئەمە نەک زەکاتە، بەڵکوو کرێیە بۆ ئەو شاگردەی کە لە لای وی چـۆک دەداو وانـە فێر دەبێ. یاخۆ ڕەنگە بیداتە کەسانێک کـە بـەردەوام پـەرای خواجەگـەلی دەوڵـەمەند دەکـەن، بـۆ ئەوەی ئەم کەسانە پێی بزانن و منەتی بەسەریاندا بـێ تـا لـە کـاتی پێویـستدا تکـای بـۆ بکـەن. بـە دەیەکی ماڵی زەکات دەیەوێ چەن دۆزی خۆی پێک بێنـێ. تەنانـەت ڕەنگـە چـاوەڕوانی پەســن و پێزانین کەن و پێیان وابێ زەکاتیان داوە.

تاقمێتر ڕژدیان لە ڕادەبەدەرەو زەکات نادەن و سامانەکەیان ڕادەگرن و کەچی خۆیان بـە پارێزکـار دەزانن، شەو بۆ شەونوێژ ڕادەبن و ڕۆژ بەڕۆژوون. ئەمانە وەکی ئەو کەسەن ژانی سـەریان بـێ، کـەچی پاژنەی پێیان دەرمان دەکەن. ئەم ساختەچییە نازانـێ کـە دەردی وی ڕژدییـە، نـەک زۆر خـواردن، دەرمانیشی خەرج کردنە، نـەک نـەخواردن. ئەمانـە گزییـەکانی خـودانی مـاڵ‌وسـامانە. کـەس لـەم مێملانە ناخەلسێ، مەگین ئەوەی وەکوو لـەم کتێبـەدا باســی کـراوە، زانیـاری کـۆوە کـاو زیانـەکانی بەندەگی و هەڵخەڵەتانی نەفس و فریوی شەیتان بناسێ؛ ئەوسا دۆســتایەتی خـودای مـەزنی بەســەر دڵدا زاڵ دەبێ و بێجگە لە نیازیان ئاوڕ لە دونیا نادەنەوە. ئەمانە مردنیان لـە پـێش خـۆ ڕانـاوەو تـەنیا کەڵکەڵەیان تەیار بوونە بۆ مردن، ئەمەش ئاسانە بۆ ئەو کەسەی پەروەردەگار پەرستنی لەبەر ساناکا.

## کتێبی چوارەم- دەربازکەرەکان (منجیات)

ئەم کتێبەش دەبێتە دە بنەما:

بنەمای یەکەم - پاشگەزبوونەوە لە گوناح (تەوبە)؛

بنەمای دووەم - پشوودرێژی و شوکرانە بژێری؛

بنەمای سێهەم - ترس و هیوا؛

بنەمای چوارەم - هەژاری و پارێزکاری؛

بنەمای پێنجەم - راستی و بێخەوشی ؛

بنەمای شەشەم - بەخۆڕاگەیشتن و چاودێری؛

بنەمای حەوتەم - رامان و پەژیوانی؛

بنەمای هەشتەم - پشت بە خوا بەستن و ناکپەرستی؛

بنەمای نۆهەم - خۆشویستن و تامازرۆیی.

بنەمای دەهەم - مردن و ئەحوالی دوارۆژ

## بنەمای یەکەم - پاشگەزبوونەوە لە گوناح یان تەوبە

بزانە، تەوبە گەڕانەوە بۆ لای خوایە. یەکەم شەقاوی موریدان و سەرەتای ڕێبازی ڕێڕەوانە. کەس لەم بوارە بازدانی بۆ نییە؛ چونکە تەنیا فریشتەکان لە سەرەتاوە تا کۆتایی دوور لە گوناحن و تەنیا شەیتانیش سەرلەبەری تەمەنی نوقمی گوناح و دژایەتی دەگەڵ ڕاستییە. تەوبە و پاشگەزبوونەوە لە گوناح و هاتنەوە بۆ سەر هێڵی ڕاست، کاری مرۆڤانە. ئەوەی بە پاشگەزبوونەوە لە گوناح رابردووی خۆی قەرەبوو کردەوە، پێوەندی خۆی دەگەڵ ئادەم دروست کردەوە؛ ئەوەش تا دوایی تەمەنی لەسەر گوناح پێداگری کرد، نێوانی خۆی لەگەڵ شەیتان ساز کرد. بەڵام مرۆڤ بۆی بووز ناخوا سەر لەبەری تەمەنی لەراستەڕێ کلانەبێ و لەسەر هێڵی ڕاست بێ، چونکە هەر لە سەرەتاوە ناتەواو و کەم ئاوەز ئافرێندراوە؛ سەرەتا ئارەزووی نەفس -کە ئامرازی شەیتانە- بە سەریدا داسەپاوە؛ ئاوەز، کە دوژمنی شاوەت و ڕووناکی گەوهەری فریشتەکانە، پاش ئەوەی شاوەت بەسەر دڵدا زاڵ بوو و شوورە وقەڵای سینگی هێنایە ژێر ڕکێفی خۆی و خووی بە نەفسەوە گرت، ئافرێندراوە. کەواتە، پاش ئەوەی ئاوەز ئافرێندرا، تۆبەو کۆشەوەی بۆ گەڕانەوە سەر ڕاستەڕێ پێوست کرد، تا ئەم شوورەو وارشەی لە دەست و پێوەندی شەیتان پاکژ بێتەوە. کەواتە، تەوبە نیازی مرۆیەو یەکەم هەنگاوی ڕێبوارانە و پاش ئەوەی بە تیشکی شەرع و ئاوەز مرۆڤ بە خەبەر بووەوە، تا ڕێ لە ناڕێ بناسێ. لە سەرەتای ئەم ڕێبازەدا تەنیا تەوبەیە کە فەرزە، چونکە واتای پاشگەزبوونەوە لە گوناحەو گەڕانەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست.

### هەڤیازی وپاداشی پاشگەزبوونەوە لە گوناح

پەروەردگار  بە هەموو باوەڕداران و سەرجەمی خەڵکی فەرمووە کە تەوبەکەن و فەرموویە: وَتُوبُوٓاْ

إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ[1]، هەرکەس هیوای رزگار بوونی هەیە، دەبێ تەوبەکا. پەیغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس بەر لەوەی خۆر لە خۆرئاواوە هەڵبێ لە گوناحی خۆی پاشگەز بێ، خودا دەیبووریێ». دیسان فەرمووی: «پەشیوانی، تەوبەیە». هەروەها گوتی: «لەسەر ڕێگای بگاری خەڵکی کە جێگای شات و شووتە، ڕامەوەستن؛ چونکە کەس هەیە لەوێ ڕادەوەستێ و هەرکی بەوێدا تێپەڕێ پێی پێدەکەنێ و هەر ژنێ ڕابوێرێ، پەیڤی کرێتی پێ دەڵێ: ئەو کەسە لەوێ هەڵناسێ تا ئەوەی دۆژهی بۆ فەرز بێ، مەگەر ئەوەی لە گوناحی خۆی پاشگەز بێتەو». پێغەمبەر گوتی: «من هەموو ڕۆژی حەفتا جار تەوبە دەکەم و لە پەروەرندەم داوای لێبوردن دەکەم». هەروەها فەرمووی: «هەرکەس لە گوناحی خۆی پەشیوان و پاشگەز بێ، پەروەردگار گوناحەکانی لە بیری ئەو فریشتانەی بۆیان نووسیوە، دەباتەوە. هەروەها لە بیری دەست و پێ و ئەو شوێنەی گوناحی پێ کراوە، دەیباتەوە، تا کاتێ لە ئاسانەی پەروەردگاردا ڕاوەستا، شایەتی بۆ نەدەن». هەروەها: «پەروەردگار تەوبەی بەندەکانی قبووڵ دەکا، بەرلەوەی گیان بگاتە بین و هەناسەی بکەوێتە ژمارە».

دیسان فەرمووی: «پەروەردگار ئامێزی پڕ بەزەیی ئاوەڵایە بۆ ئەوانەی بە ڕۆژ تووشی گوناح دەبن و بەشەو پاشگەز دەبنەوە، هەروەها بۆ ئەوانەی بە شەو تووشی گوناح دەبن و بە ڕۆژ پەشیوان دەبنەوە؛ دەیانبوورێ تا ئەو دەمەی هەتاو لە ڕۆژاوا هەڵدێ». عومەری خەتاب دەڵێ کە پێغەمبەر فەرمووی: «تەوبە بکەن، من ڕۆژی سەدجار تەوبە دەکەم». هەروەها گوتی: «هیچ مرۆیەک نییە کە گوناحبار نەبێ، بەڵام چاترین گوناحکاران، ئەوانەن کە لە گوناحیان پاشگەز دەبنەوە». هەروەها: «هەرکەس لە گوناحی پاشگەز بێتەوە، وەکی کەسێکە کە چجار گوناحی نەکردبێ». دیسان گوتی: «تەوبە ئەوەیە کە چیتر نەڕۆیتەوە لای». پێغەمبەر فەرمووی: «ئەی عایشە! إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ[2]، ئەمانە داهێنەرن. هەرکەس گوناحێ بکا دەتوانێ پاشگەز بێتەوە، بێجگە لە داهێنەر کە گەڕانەوەیان بۆ نییە. من لەوان بێزارم و ئەوانیش لە من». دیسان فەرمووی: «کاتێ ئیبراهیم بۆ ئاسمان برا، پیاوێکی دی لەگەڵ ژنێ زینای دەکرد، بۆیان دوعای کرد تا مردن؛ یەکێکیتری بینی گوناحی دەکرد، دوعای ئەویشی کرد؛ وەحی بۆ هات کە "ئەی ئیبراهیم! واز لە بەندەکانم بێنە، بەڵکوو لە سێ کار یەکیان بۆ پێک بێ: گەر پاشگەز بنەوە، دەیپەزێرم، گەر داوای لێبوردن کەن، دەیانبوورم، یان گەر منداڵێکیان بێ کە پەرستندەی من بێ، لە بەرخاتری ئەو منداڵە لێیان خۆش

---

١ - (قورئان ، ٣١/٢٤) هەمووتان بگەڕێنەوە لای خودا، ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بەشکوو گشتوو ڕزگار بن. (هـ)

٢ - (قورئان، ١٥٩/٦) ئەو کەسانەی دینەکەیان پەرژ و بلاو کردۆتەوە و دەستەی لێکتر جیاوازیان پێک هێناوە، پێویستە تۆ لەوان نەبی. (هـ)

دەبم، مەگین نازانی یەک لە ناوەکانی من پشوودرێژە"». عایشە دەڵێ پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم کە زانی بەندەیەک لە کردەی خۆی پەشیوانە، بەر لە تکا بۆ لێبوردنی، لێی دەبووریّ». دیسان گوتی: «لە لای خۆرئاواوە دەرگایەک هەیە، پانتای حەفتا ساڵ رێگایە، بۆ پاشگەزبوونەوە ئاوەلایە. لەو دەمەیڕا زەوی و ئاسمان ئافرێندراوە، ئەو دەرگایە ئاوەلایە تا ئەوەی هەتاو لە رۆژاواوە هەڵبێ». دیسان گوتی: «رۆژی دووشەمۆ و پێنج شەمۆ کردەوەکان رادەنێن: هەرکەس تەوبەی کردبێ، وەردەگیرێ؛ هەرکەس داوای لێبوردنی کردبێ، لێیدەبوورن؛ بەڵام ئەوانەی دڵیان هەروا تەژی لە خۆبەزلزانییە، دەمێننەوە». هەروەها فەرمووی: «تەوبەکار خۆشەویستی خودایەو ئەوی پاشگەز بێتەوە، وەکوو ئەوەیە کە گوناحی نەکردبێ». دیسان فەرمووی: «کابرایەکی عارەب لە بیاواندا خەو دەیباتەوە، کە هەڵدەستێ، خوشترەکەی بە توێشووی رێگاو نان و ئاوەوە رۆیشتووە. کابرا لەو بیابانە قاقڕەدا دەکەوێتە دووی حوشترەکەی، تا هێزی دەبڕێ دەگەڕێ بە دوویا، کە نایبینێتەوە، نسک و ناهمێ و دەستەئەژنۆ لە شوێنێکدا برسی و تینو دادەنیشێ و سەر دادەخاو چاوەنۆڕی مردن دەبێ. لەبەر ماندوویەتی خەو دەیباتەوە، پاش ماوەیەک کە لە خەو رادەبێ، چ دەبینێ؟ حوشترەکەی بە بارەوە لەسەر سەری راوەستاوە، شاگەشکە دەبێ و لە خۆشیانا بە جێی ئەوەی بڵێ: "ئەی پەروەرندەم! من بەندەی تۆم"، دەڵێ: "ئەی بەندەی من، من پەروەرندەتم". پەروەردگار کاتێ بەندەی لە گوناحێک پاشگەز دەبێتەوە، پتر لەم کابرا کە حوشترەکەی بە بارەوە دیوەتەوە، خوشحاڵ دەبێ».

### راستەقینەی پاشگەزبوونەوە

بزانە کە سەرەتای تەوبە، رۆناهی ناسین و بڕوایە کە لە دڵدا پێ دەبێ و لەبەر ئەو رووناکیە دەبینێ کە گوناح وەکی ژاری کوشندەیە. کە دەبینێ ژاری زۆری خواردۆتەوەو لە مردن نزیک کەوتۆتەوە، ناچار پەشیوانی و ترسێک لە دڵیدا دێتەدی؛ وەکوو کەسێک کە ژاری خواردۆتەوەو پەشیوان بێ و ترس بنیشێتە سەر دڵی و نینۆکی لە قورگی بەربدا تا ژارەکەی بڕشێتەوەو بە پووچەڵکردنی ئاسەواری ئەو ژارە، هانا دەباتە بەر دەوا و دەرمان. هەروەها کە دەبینێ هەر ئارەزوویکی نەفس کە پێکی هێناوە، لە سەرەتا وەکوو هەنگوین شرین بووە، کەچی لەگەڵ ژارێکی کوشندە تێکەڵ کراوەو لە دواییدا ئاسەوارەکەی دەبینێ، لەوەی کردوویە پەژیوان دەبێ، ئاوری ترس بەردەبێتە گیانی، کاتێ خۆی لە ئاسانەی مردندا دەبینێ، بەو ئاورە ئارەزووی گوناح لە ناخیدا دەسووتێ و دەبێتە پەشیوانی و هەناسەساردی و بڕیار دەدا کە رابردووی قەرەبوو کاتەوەو لە داهاتوودا توخنی گوناح نەکەوێ و رایەخی ستەم هەڵدەپێچی و خوانی ئەمەگ رادەخاو نووکوبە دی کردەکانی دەگۆڕێ: پێشتر

ژیانی کەیف و خۆشی و زلزلەو پێکەنین بوو، لەمە بەدوا شین و شەپۆرو گریان؛ بەر لەمە ئاخاوتن دەگەڵ لاڕێیان کاری بوو، لەمە بەدوا دەگەڵ زاناو تێگەیشتووان. کەواتە، راستەقینەی تەوبە، پەژیوانییەو بناغەی رۆناهی، زانست و بڕوایەو لق و پۆی، گۆڕانی حاڵ و سەرلەبەری هەڵس و کەوتی ئەندامانە لە گوناحەوە بۆ چاکە.

## شرۆڤەی ئەمەی کە پاشگەزبوونەوەلەهەرکاتدا بۆ هەموو کەس فەرزو پێویستە

پێویست بوونی تەوبەلەهەمووان، بە مەدەبێ لێت خویان بێ کە هەرکەس باڵغ بوو و کافر بوو، دەبێ لە کوفر پاشگەز بێتەوە و تەوبەی لەسەر فەرز و پێویستە؛ گەریش موسوڵمانە، بەلام بە چاولێکەری لە دایک و بابی بۆتە موسوڵمان، دەبێ لەو نەزانینە تەوبە کاو وابکا کە دڵی لە راستەقینەی بڕوا ئاگا بێتەوەو بە تیشکی ئەو رووناکییە، تەم و تاریکی لە کۆڵ بێتەوە. مەبەستمان لەم ئاگادارییە ئەو بەڵگانەی کە کەلاموانان دەیڵێن نییە، ئەوە فەرزو پێویست نییە؛ بەڵکوو مەبەست ئەوەیە خونکاری ئیمانی بە سەردڵدا زاڵ بێ و هەموو دەستوورێک هی ئەوبێ و کەس لە فەرمانی کلا نەبێ. کاتی فەرمان، فەرمانی بڕوایە، کە هەر دەستووری لە ولاتی لەش دەردێ، سەرلەبەری هی بڕوا بێ، نەک هی شەیتان. هەروەها گەر تووشیاری گوناح بێ، بڕوای نوقسانەو تەواو نییە. هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «کەس نییە زیناکاو لە کاتی زینادا بڕوادار بێ، یان دزی کاو لە کاتی دزیدا بڕوای هەبێ»، مەبەست ئەوە نییە کە لەو کاتەدا کافرە، بەلام بڕوا لقوپۆی زۆری هەیە و یەکێک لە لقەکانی ئەوەیە کە دەزانێ کە زینا ژاری کوشندەیە. ئەوەی دەزانێ ئەوشتەی کە دەیخوا ژاراوییە، چجار لێوی بۆ نابا. کەچی لەو دەمەدا سوڵتانی شاوەت رەوی‌خستۆتە[1] نێو لەشکری ئەوبڕوایە کە زینا بەکوشندە دەزانێ، تا بە نەزانی و ئاگالێبڕان ئەو بڕوایە بەڕێپوارکا، تا ئەو رووناهیە لە نێو دووکەڵ و تەم ومژی شوبهەو لێلێدا بزربێ.

هەروەک زانیت، سەرەتا پاشگەزبوونەوە لە کوفر پێویستە؛ گەر کافر نەبێ، لە بڕوای میراتی و ئاسایی دەبێ تەوبە کات. کە وایکرد، زۆرتر وایە کە لانیکەم تووشیاری چەن گوناحێ بووە، دەبێ لەوانەش بگەڕێتەوە؛ کە رواڵەتی خۆی لە گوناح پاکژ کرد، دەروونی لە تووی ئەو گوناحانە بێوەر نییە، وەکوو حەز بە خواردن و خواردنەوەو پەیڤین و خۆش ویستنی ماڵوساماں و پلەو پاگەو ئێرەیی و لووتبەرزی و مەرایی و شتی‌تر لەم کوشندانە. چونکە هەموو ئەمانە خەیانەت بە دڵن و بناغەی گوناحن؛ دەبێ لە هەمووی ئەمانە پاشگەز بێ تا ئەوەی هەر یەکەیان لەسەر جێی خۆی دامرکێ و

---

١ - رەوتێخستن: تێک شکاندن.

گەردن‌کەچ و گوێڕایەڵی ئاوەز و شەرعیان کا؛ ئەم کارەش بە کۆشــەوەیەی دوور و درێــژ نــەبێ پێــک نایە؛ گەر لەمانەش بەری بێ، لە وازوازی و دنەی نەفس و خەیاڵاتی خــاو بــۆش نابــێ، پاشــگەزبوونەوە لەوانەش پێویستە؛ گەر لەمەش پاقژ بۆوە، بڕێ جار لە یادی خودا خافڵ دەبــێ، بنــەمای ســەرلەبەری کەمایەســیەکانی مــرۆڤ لــە بیرچــوونی یــادی خودایــە، هەرچــەن بــە قــەدەر چرکەیــەکیش بــێ؛ پاشگەزبوونەوە لەمەش پێویستە؛ گەر وای لێ هات کە هەردەم خەریکی بیرو ویر بــوو قــەد لــە رامــان دانەماو بیری‌تری بە خەیاڵدا رانەبورد، دیسان مەقامەکان جۆربەجۆرن و هەریــەک لــەویتر جیایــەو بــە رێژەی مەقامی سەرتر نوقسانەو قنیات‌کردن بە رادەی نزم - گەر بــۆی بلــوێ لــەوەش ســەرتر بــڕوا- رژدی وخەسار و زیانە و تەوبە لەوە پێویستە.

ئەوەش کە پێغەمبەر فەرمووی من رۆژی حەفتا جار تەوبە دەکەم و داوای لێبوردن لە خــوا دەکــەم، هۆکەی ئەوەیــە کــە پێغەمبــەر بــەردەوام لــە هەڵکــشان و پێــشوەچووندا بــوو، کــە دەگەیــشتە هــەر پاگەیەک، بەرزتر دەبوو و ئەوەی پێشووی بە خوارتر دەزانی و لەوەی رابــردوو پاشــگەز دەبــوو و داوای لێبوردنی دەکرد. چونکە گەر کەســێک کارێــک بکــاو ئــەو کــارەی درهــەمێ بایــەخی بــێ و ئــەو دە درهەمی دەست کەوێ، پێی شادوشوکر دەبێ؛ بەلام گــەر بزانــێ کــە دەیتــوانی دینــارێ بــە دەســت بێنێ، کەچی ئــەو بــە درهــەمێ قینــاتی کــرد، خــەمبار دەبــێ و پــەژارە دایــدەگرێ، تــا ئــەوەی کــە دینارەکەی دەست کەوێ و پێی شاد بێ و وابزانێ کە هــیچ شــت ســەرتر لەمــە نییــە؛ کــە زانی ئــەو کارەی دینارێکی دەست خستووە، بایی گەوهەرێک نرخــی هەیــەو گەوهەرەکــە هــەزار دینــار دەژی، دیسان خەم و کەسەر دایدەگرێ و لەو نەزانکارییەی پەژیوان دەبێ و پاشگەز دەبــێ. بۆیــە گوتوویانــە: «حَسَنَاتُ الْاَبْرارِ سَيِّئَاتُ الْمُقَرَّبِينَ». واتە چاکەی پارێزکاران، لە چاو نزیکانی خوادا هەڵــە و نوقــسانە، بۆیــە لێی تەوبە دەکەن.

**پرسیار:** رەنگە کەسێک بڵێ: کە کەسێک لە کوفرو گوناح تەوبــەی کــرد، پاشــگەزبوون لــە هەڵــەو کورتی بۆ گەیشتن بە پلەو پاگەی سەرتر، پایەبەرزی و هێژاییە نــەک فــەرز، بــۆچی گوتــت گەڕانــەوە لەمەش فەرزو پێویستە؟

**پەرسڤ:** پێویست و فەرز دوو کەرتە:

**یەکەم** ئەو شتەیە کە لەڕێدانی[1] رواڵەتیدا دەبێژرێ و بە قەدەر ئاستی فامی زۆربــەی خەڵــکە؛ گــەر خەڵکی بپەرژێنە سەر ئەم رادەیە دونیا وێــران نابــێ و خــەریکی ژیــنی دونیــایی دەبــن و لــە ســزای

١ - رێدان: فتوا.

دۆژەهیش دەرباز دەبن.

**فەرزی دووەم** ئەوەیە کە زۆربەی خەڵک توانی بەڕێوە بردنیان نییە؛ هەرکەس توخنی نەکەوێ تووشی سزای جەحەننەم نابێ، بەڵام لە سزای هەناسەساردی بۆ نەگەیشتن بە پلەی سەرتر دەرباز نابێ؛ چونکە لە دوارۆژدا تاقمێ دەبینێ سەرتر لە خۆی، وەکوو هەسارە بە ئاسمانەوە، ئەو پەژیوانی و هەناسەساردییەش خۆی سزایەکی گورچکبڕە؛ ئەو گەڕانەوەی کە گوتمان پێویستە، بۆ خەڵسین لەم سزاو ئازارەیە. هەروەک لەم دونیایەش زۆر دەبینین کە کەسێک خزمێکی پتر لەوی دەسکەوتووەو زۆرتر سەرکەوتووە، ئاوری ئێرەیی بەردەبێتە گیانی و ژینی لێ دەکا بە ژار، هەرچەند بۆ خۆی لە لێدان و ئازار و سزا رزگار بووبێ. بۆیە گوتویانە رۆژی پەسلان، رۆژی داخ هەڵکێشانە، چونکە کەس لە زیان بەری نییە: ئەوەی عیبادەتی نەکرد، دەڵێ بۆم نەکرد، ئەوەی کردی دەڵێ بریا فرەترم بکردایە. لەم سۆنگەوە پێغەمبەران و ئەولیا ئەوەی لە عیبادەت پێیان دەکرا، بەجێیان دەهێنا، تا دوارۆژ تووشی داخ و ئاخ هەڵکێشان نەبن. چ دەڵێی کە پێغەمبەر خۆی بە برسی رادەگرت، مەگین نەیدەزانی کە نانخواردن حەرام نییە. تا ئەوەی عایشە گوتی: «دەستم بە زگیا هێنا، دڵم پێ سووتاو بۆی گریام؛ گوتم: "بە قوربانت بم! چ دەبێ گەر لە خواردنی ئەم دونیا تێر بخۆی؟" فەرمووی: "ئەی عایشە! برا ئوولولعەزمەکانم بەر لەمن رۆیشتن و میهرەبانی زۆریان بینی و خەڵاتی زۆرو زەوەندیان وەرگرت، دەترسم گەر لە دونیا بەش بەرم، لەوان خوارتر بم؛ چەن رۆژ پشوودرێژی و برسێتیم پێ خۆشترە تا دواکەوتن لە براکانم"». عیسا نووست و بەردێکی نایە ژێر سەری. ئیبلیس پێیگوت: «مەگەر وازت لە دونیا نەهێنا بوو، بۆچی ئێستا پەشیوانی؟» گوتی: «چیم کردووە؟» گوتی: «بەردت ناوەتە ژێر سەرت و راتبواردووە». عیسا بەردەکەی فڕێ داو گوتی: «ئەمەشم دەگەڵ دونیا بۆ تۆ دانا». پێغەمبەر بەنێکی نوێی لە پێڵاوەکانی خستبوو، کە چاوی پێکەوت و پێی جوان بوو، کردیەوەو فەرمووی تا بەنە کۆنەکەی بۆ بێننەوە. جارێک ئەبووبەکر پەرداخێ شیری خواردەوە، کە زانی شوبهەی لەسەرە، ئەوەندە قامکی لە قوڕگی بەردا وەختە بوو گیانیشی دەگەڵی دەربێ. چ دەڵێی، بە ڕای تۆ نەیدەزانی کە بە گوێرەی رێدانی خەڵکی رەمەکی ئەمە پێویست نییە؟ بەڵام رێدانی خەڵکی ئاسایی شتێکەو مەترسی کار کە نزیکانی خوا هەستیان پێ کردووە، شتێکیترە. کەس وەکوو ئەمانە پەروەردگارو رێگەی پڕ لە هەورازو کۆسپ و ئاستەنگی خوا ناناسێ. پێت وانەبێ بە خۆڕایی ئەم ئازارانەیان داوەتە بەرخۆ. پێڕەوی ئەوان کەو گوێ بە رێدانی خەڵکی ئاسایی مەدە، چونکە ئەوە باسێکیترە.

بەمەی بێژرا تێگەیشتی کە بەندە لە هیچ دۆخێکدا لە گەڕانەوە بێ نیاز نییە. لەم سۆنگەوە بووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «گەر مرۆڤ تەنیا بۆ ئەو شتانەی لە درێژایی تەمەنیدا فەوتاندوویە بگری،

ئەم خەموپەژارە تاکاتی مردنی بەردەوامە. کەواتە چ دەلێی بەو کەسەی داهاتووشی وەک رابردووی بە خەسار دەدا». بزانە، هەرکەس گەورهەرێکی دانسقەی بێ و بۆی بفەوتێ، ئاساییە بۆی بگری؛ گەر ئەو شتەی فەوتاوە ببێتە هۆی بەلاو ئازار بۆی، شین و شەپۆری فرەتر دەبێ، هەر هەناسەیەک گەوهەرێکە کە بەختەوەری دوارۆژی پێ راوەدەکرێ. گەر کەسێک ئەم گەوهەرە لە گوناحدا خەرج کا تا ببێتە هۆی فەوتانی خۆی، کە لەم راستییە ئاگادار بوو، دەبێ حالی چۆن بێ؟ بەلام کاتێک هەوالی ئەم کارەساتەی پێ دەگا، کە خەم و پەژارەو ئاخ هەلکێشان هیچ کەلکی بۆ نابێ. ئەمەی کە پەروەردگار دەلێ: وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ[1]. دەلێن واتای ئەم ئایەتە ئەوەیە کە بەندە لە سەرەمەرگدا پێمیرد دەبینێ، دەزانێ کە کاتی مردنە، هەناسەیەکی سارد هەلدەکێشێ کە دوایی بۆ نییە. دەلێ: رۆژی زۆرت لە پێش بوو، کەچی ئێستا تەمەنت دوایی هاتووەو هیچ رۆژت لەبەر نەماوە. دەلێ: سەعاتێک مۆلەتم پێ بدە. دەلێ: کاتت دوایی هاتووە، هیچت نەماوە. کە ئەم چەشنە پەرسڤی وەرگەراندەوەو ژاری ناهۆمێدی پێ نۆشاند، بڕوای دەکەوێتە مەترسییەوە، گەر -پەنا بە خوا- لە ئەزەلدا، چارەڕەشییان لە چارەیدا نووسیبێ، بە دڕدۆنگی و گومانەوە لە دونیا دەردەچێ و دلەدواو چارەڕەش دەبێ. بەلام کە بەختی گەشیان بۆ نووسیبێ، بڕوای بە بێوەی دەردەچێ. لەم سۆنگەوە پەروەردگار فەرمووی: وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ[2]. دەلێن پەروەردگار دەگەل بەندەکانی دوو رازی هەیە: یەکەم کاتێ لە دایک دەبێ پێی دەلێ: تۆم بە پاکی و رازاوەیی ئافراند و ئەم تەمەنەم بە ئەمانەت پێت ئەسپارد، ئاگادار بە لە سەرەمەرگدار چلۆن ئەم ئەمانەتم پێ دەدەیتەوە. ئەو رازیتری پەروەردگار لە گیانەلادایە، دەلێ: بەندەی من! بەو ئەمانەتەی پێتم ئەسپارد، چیت کرد؟ گەر بە جوانی پاراستووتە، پاداشەکەی وەردەگری، گەریش فەوتاندبێتت دۆژەهـ چاوەڕوانتە، خۆت تەیار کە.

## شرۆڤەی قەبوولکردنی تەوبە

بزانە، گەر پاشگەزبوونەوە بە پێی مەرجەکانی خۆی بێ، بێ شک وەردەگیرێ. کە تەوبەت کرد، لە قەبوولکردنی دڕدۆنگ مەبە، لە مەرجەکانی بە گومان بە.

---

١ - (قورئان ٦٣/١٠) لەو بژیوەش کە ئێمە پێمان بەخشیون، لەڕای خودای بەخت بکەن؛ بەرلەوەی یەکێ لە ئێوە مردن تەک بە تەکیەوەدا و بێژێ: ئەی پەروەرندەی من! بۆچی تا ماوەیێ نزیک مەودات نەدام. (هـ)

٢ - (قورئان – ٤/١٨) ئیتر پەژیوان بوونەوەی ئەوان هیچ بەهرەی نییە کە لە وەختی گیانەلاودا دەلێن: ئێمە پەژیوانین. (هـ)

ئەوەی زانی کە راستەقینەی دڵی مرۆڤ چییە، بە چ شێوەیەک دەگەڵ لەش پێوەندی هەیە، پێوەندی لەگەڵ پەروەرندەی چۆنە، پەردەی نێوانیان چییەو چۆنە، گومانی نامێنێ کە گوناح لەمپەرێکە لە نێوان بەندەو خوداو گەڕانەوە لە گوناحیش سڕین و لابردنی ئەو پەردەیە. چونکە دڵی مرۆڤ گەوهەرێکی پاک و بێخەوشە وەک گەوهەری فریشتەکان، وەکی ئاوێنەیەک کە دیمەنی پەروەرێنەری تێدا سەیر دەکا، گەر پاک و بێخەوش لەم دونیایەدا بڕواتە دەر. هەر گوناحێک تۆز و گەردێکە لەسەر ئاوێنەی دڵ؛ بە هەر بەندەگییەک تیشکێک دەدا لە دڵ و ئەو زەنگارە لە دڵ دەسڕێ. شۆڕی تیشکی بەندەگی و زەنگاری گوناح بەسەر ئاوێنەی دڵدا بەردەوام و دوابەدوایە. کە رەشایی زۆری گرت و پاش ئەوە لە گوناح پاشگەز بوو، رۆناهی عیبادەت سوپای تاریکی کە دڵی داگرتووە، تێک دەشکێنێ ودڵ دەگەڕێتەوە بۆ دۆخەکەی جاران؛ مەگەر ئەوەی کە ئەوەندە لەسەر گوناحدا پێیداگرتبێ کە تاریکی لە ناخی دڵی رۆچووبێ و گەیشتبێتە گەوهەری دڵی و هیچ دەرمانێ بەسەریدا کاریگەر نەبێ؛ وەکوو ئاوێنەیەک کە زەنگار خواردبێتی و لە ناخیدا رۆچووبێ. ئاوەها دڵێک ناتوانێ پاشگەز بێتەوە، مەگین ئەوەی هەر بە دەم بڵێ تەوبە دەکەم. دڵ بە پەرستن و بەندەگی لە پیسایی گوناح پاکژ دەبێ، هەروەکوو چۆن جلکی پیس بە سابوون و ئاو تەمیس دەبێ. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «پاش هەر گوناحێک چاکەیەک بکەن تا خراپەکەتان بسڕێتەوە». دیسان فەرمووی: «گەر ئەوەندە گوناح بکەی کە بگاتە تەشقی ئاسمان و پاشان پاشگەز بێتەوە، پەروەردگار دەتپەزێرێ». دیسان گوتی: «بەندە هەیە بەهۆی گوناحەوە دەڕواتە بەهەشت». دەڵێن رەنگە ئیبلیس بڵێ بریا تووشی ئەم گوناحەم نەکردایە. پێغەمبەر فەرمووی: «چاکەکردن وا گوناح دەسڕێتەوە کە سابوون چڵک و پیسایی جلوبەرگ». دیسان فەرمووی: «کاتێ ئیبلیس کەوتە بەر لەحنەت، گوتی بە پەروەردگار: "سوێند بە گەورەییت لە دڵی مرۆڤ نایێمەدەر تا گیانی لە لەشدا بێ"، خوداش فەرمووی: "سوێند بەگەورەییم! دەرگای تەوبەی لێ داناخەم تا گیانی لە لەشدا بێ"».

کابرایەکی حەبەشی هاتە لای پێغەمبەر و گوتی: «خراپەی زۆرم لێ وەشاوەتەوە، تەوبەم قبووڵ دەکرێ؟» فەرمووی: «قبووڵ دەکرێ». رۆیشت و دیسان گەڕایەوە و گوتی: «لەو کاتەدا کە خەریکی گوناح بووم، چاوی پێمەوە بووە؟»فەرموی: «چاوی پێتەوە بووە». کابرا نەعرەتەیەکی کێشا و کەوت و گیانی دابەدەستەوە.

فوزەیل دەڵێ: «پەروەردگار بە یەکێک لە پێغەمبەرانی گوت: "مزگێنی بدە بە بەندە تاوانبارەکانم کە ئەگەر پاشگەز بنەوە، دەیانپەزێرم؛ هەروەها پارێزکارەکانیش بترسێنە کە گەر دادوەرانەو بە پێی کردەوەکانیان دەگەڵیان بجووڵمەوە، هەموویان سزا دەدرێن"».

«وطلق بن حبیب» دەڵی: «مافەکانی پەروەردگاری مەزن پتر لەوەن کە بەجێ بهێنرێن. هان

بدەن تا بەیانیان بە تەوبەوە هەستن و شەوان بە تەوبەوە سەر بنێنە سەر سەرین».

حەبیب کوڕی سابت دەڵێ: «گوناحەکانی بەندە لە پێشی خۆی رادەنێن، دەگاتە گوناحێکی و دەڵێ: "ئاخ! هەردەم لە تۆ دەترسام"؛ ئەوسا ئەو ترسەی دەکەنە خەرجی گوناحەکانی تری و دەیبوورن».

لە نێو بەنی ئیسرائیلدا کابرایەک گوناحی زۆری کردبوو، ویستی تەوبەکا، نەیدەزانی دەیپەزێرن یا نە. ناردیانە لای کابرایەک کە پارێزکارترینی خەڵکی بوو. لێی پرسی: «تاوانی زۆرم کردووە، نەوەد و نۆ کەسم کوشتووە. دەتوانم پاشگەز بمەوە یان نە؟» گوتی: «نە». ئەو کابرایشی کوشت تا بوو بە سەد کەس. ناردیانە لای زاناترینی رۆژگار، رۆیشت و راستی رووداوی ژینی پڕ لە گوناحی بۆ گێڕایەوەو پرسی: «گەڕانەوەم بۆ هەیە یان نە؟» گوتی: «هەیە، بەڵام دەبێ لەم وڵاتە کە تەژی لە خراپەیە بار کەی و برۆیتە فلان وڵات کە خەڵکێکی چاک و پاکی تێدا دەژین». کابرا کەوتەڕێ و لە نێوانی رێگادا ئەمری خودای بە جێ هێنا. فریشتەگەلی بەزەیی و سزا ناکۆکی کەوتە نێوانیان و هەریەکیان دەیگوت لە وڵاتی مەیە. خودا فەرمووی تا بیپێون، بە قەدەر بستێک لە وڵاتی چاکان نزیک بوو. فریشتەگەلی بەزەیی گیانیان برد. بەم چەشنە ئاشکرا بوو کە مەرج نییە کە تای خراپەکان خاڵی بێ؛ بەڵام دەبێ تای چاکەکان نەختێ قورستر بێ؛ هەرچەن ئەونەختە زۆریش کەم بێ، بەڵام دەبێتە هۆی رزگاری لە دۆژەهـ.

## شرۆڤەی گوناحی بچووک و گەورە

بزانە تەوبە، پاشگەزبوونەوە لە گوناحە، گوناح هەرچەن بچووکتر بێ، گەر پێداگری لەسەر نەکرێ، ئاسانترە. لە خەبەردا هاتووە «کە پێنج فەرزی نوێژ قەرەبووی سەرلەبەری گوناحە بچووکەکان دەکا. نوێژی هەینی، هەرچی گوناحی بچووکی ئەو هەینی تا ئەم هەینی بێ قەرەبووی دەکاتەوە». پەروەردگار فەرمووی: إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ[1].

گەر لەو گوناحە زەلامانە واز بهێنن، هەڵەوپەڵەی دیکەتان لەسەر لادەدەن. کەواتە گەرەکە بزانی زەلامەکان کامن. یارانی پێغەمبەر لەمەدا رایان جیاوازە. هەندێ حەوتیان گوتووەو هەندێ کەمتر و هەندێ فرەتر. ئیبنی عەبباس لە ئیبنی عومەری ژنەفت کە گوتی: «زەلامەکان حەفتن». گوتی: «لە حەفتا نزیکترە تاکوو حەوت». ئەبوو تالبی مەککی نووسەری «قوت القلوب»، دەڵێ: «لە سەرجەمی ئەخبارو پەیڤی ئەسحاب حەڤدە گوناحی زەلامم کۆکردەوە:

---

١ - (قورئان، ٣١/٤) ئەگەر ئێوە ئەو تاوانە زەلامانەی پێمان راگەیاندوون نەیکەن وخۆتان دوورەپەرێز بگرن، هەڵە و پەڵەی دیکەتان لە سەر لادەدەین و دەتانبەینە شوێنێکی بە قەدر و عیزەت. (هـ)

**چوار لە دڵدا**: یەکەم کفرە؛ دووەم پێداگری لەسەر گوناح؛ هەرچەند بچووکیش بێ، وەکوو ئەوەی کەسێک کارێکی خراپ کاو چجار بیر لە تەوبە نەکاتەوە؛ هەروەها ناهومێدی لە بەزەیی پەروەردگار کە دڵساردی پێ دەڵێن؛ ئەویتریان ئارخەیان بوونە لەفێڵی پەروەردگار، بە چەشنێ کە دڵنیابێ کە خودای لێیبوردووە و بەخشیویە.

**چوار لەزماندا**: یەکەم شایەتی بەدرۆیە، بە چەشنێ کە مافی کەسێکی پێ بفەوتێنرێ؛ دووەم؛ بوختان بۆ ژنانی مێردار، بە چەشنێ کە حەددی گەرەک بێ؛ سێهەم، سوێندی بەدرۆ، بە جۆرێ کە بەو سوێندە بە ناڕەوا ماڵێ لە کەسێ بستێنێ؛ چوارەم ئەفسوونە، چونکە ئەوەش هەندێ وشەیە کە بە زمان دەبێژرێ.

**سێ لە زگدا**: یەکەم خواردنەوەی مەی و هەرچی ببێتە هۆی مەستی؛ دووەم ماڵی سێوی خواردن؛ سێهەم سوودان و سووخواردنە.

**دوو لە شەرمگادا**: زیناو نێربازی.

**دوو لە دەستدا**: کوشتن و دزیکردن، بە چەشنێ کە شیاوی حەد لێدان بێ.

**یەک لە پێدا**: ئەوەش هەلاتن لە شەڕ دەگەڵ کافرانە، بە چەشنێ کە یەک کەس لە بەرانبەر دووکەس هەڵبێ، یان دەکەس لە هەمبەر بیستکەس هەڵبێ؛ بەلام گەر پتر لەوە بوون هەلاتن ڕەوایە.

**یەک لە هەموو لەشدا**: ئەوەش نافرمانی داک و بابە.

بزانە، ئەمانەیان بەوە زانیوە چونکە بۆ برێکیان حەد گەرەکەو هەندێکیشیان لە قورئاندا هەڕەشەی بە سامی لێ کراوە. ڕاڤەی ئەم باسە لە کتێبی ئەحیادا کراوەو ئەم پەرتووکە جێگای ئەو لێکدانەوەیە نییە. مەبەست ئەوەیە پتر ئاگاداری تووشبوون بەو گوناحە زەلامانە بی.

دەبێ بزانی سووربوون لەسەر گوناحی بچووک، زەلامەو هەرچەند دەڵێن بە جێهێنانی فەرزە بچووکەکان قەرەبووی دەکاتەوەو لەمەدا هیچ گومان نییە، بەلام گەر دانگێ بەزۆر لە کەسێ بکەوێتە گەردنی و نەیداتەوە بە خاوەنی، تا نەیداتەوە لە گەردنی ناکەوێ. بە گشتی هەر گوناحێ کە لە ئاست پەروەردگاردا بێ لە بوردن نزیکترە تا ئەو تاوانەی لە ئاست خەڵکدا بێ. لە خەبەردا هاتووە کە «دەفتەری گوناحان سێن: دەفتەرێ کە نابەخشرێن، ئەوانەش کوفرو ئامبازدانان بۆ خودایە؛ دەفتەرێ کە دەبەخشرێن، ئەوەش ئەو گوناحانەی نێوان بەندەو خودایە؛ دەفتەری کە نابەسترێ ئەوەش دەفتەری ستەم لە بەندەکانی خودایە». بزانە، هەرچی ببێتە هۆی ئازاری موسوڵمانێ، لەم ڕیزەیە، گەر لە نەفسدا بێ، یان لە ماڵوسامان، یان لە شانوشکۆو پیاوەتی، یا خۆ لە دیندا. هەروەک ئەوەی کەسێک خەڵکوخوا گاس کا بۆ داهێنان تا دینیان لێ بسێنێ، یان کەسێک کە خەڵک کۆ دەکاو

بۆیان قسەبکات تا بۆ گوناح‌کردن دنەیان بدا.

## شرۆڤەی ئەو شتانەی گوناحگەلی بچووکی پێ زەلام دەبن

بزانە، گوناحە بچووکەکان بۆیان هەیە ببەخشرێن، بەڵام هەندێ هۆکـار دەتـوانن زەلامیـان کـەن و مەترسیان ئەستەم و دژوارکەن. ئەو هۆکارانە شەشن:

**یەکەم،** ئەوەیە کە پێداگری کا. وەکی کەسێک کە بـەردەوام خوسـپەکا، یـان بـەرگی ئاوریـشمین دەبەرکا، یاخۆ گوناح‌کردنی بەردەوام؛ ئەمانە لە رەش‌کردنی دڵدا ئێجگار کاریگەرن؛ هـەروەکوو چـۆن پەرستنی بەردەوام لە رروونکردنەوەی دڵدا زۆر کاریگەرە. لەم سۆنگەوە بـوو کـە پێغەمبـەر فـەرمووی: «چاترین کار، ئەو کارانەن کە بەردەوام بن، هەر چەن زۆرکەم بن». ئەمە وەکوو ئەو دڵۆپە بارانـەن کـە بەردەوام و بێ پسانەوە داببارێن و بەردێکی رەق کون دەکەن. ئەگەر ئاوەکەت بـە خـوڕ بـە سـەردیدا لێژ بدایە، هیچ کاریگەرییەکی نەبوو. کەواتە، هەرکـەس کـە بـە گونـاحێکی بچـووک تـووش دەبـێ، پێویستە لە کردەی خۆی پەشیوان و پاشگەز بێ و بـڕیار بـدا کـە چجـار تووشـیاری نـەبێ؛ تەنانـەت دەڵێن: گوناحی زەلام بە تەوبە بچووکەو بچووکیش بە پێداگری زەلامە.

**دووەم،** گەر گوناح بە بچووک بزانرێ و بە سووکی سەیری بکرێ، دەبێتە گوناحی گـەورە. هـەروەها گەر گوناح بە زەلام بزانرێ دەبێتە گوناحی بچووک. چونکە بە زل زانـینی گونـاح لـە تـرس و بـڕواوە سەرچـاوە دەگـرێ، ئەمـەش یارمـەتی دڵ دەدا تـا زەنگـاری گونـاح شـۆپی بەسـەر دڵـدا نـەمێنێ. بچووکـزانینی گوناحیش لە بێ ئاگایی و هوگرێتی گوناحەوە هەڵدەستێ.

ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە دەگەڵ دڵ کەین‌وبەینی بەستووەو دۆزی سەرەکی ئەمانەش دڵە. هەرچی پتر لەدڵدا کاریگەر کەوێ، گەورەترە. لە خەبەردا هاتووە کە: «بڕوادار گوناحی خۆی وەکوو کێوێک دەزانێ لە ژوور سەریەوەو هەردەم دەترسێ بە سەریدا خاپوور بێ، بەڵام دوڕاز بەمێشکێکی دەزانێ کە لەسەر کەپۆی نیشتووە». دەڵێن: «ئەو گوناحەی کە خێوەکەی بڵێ ئەم گوناحەم هیچ نییە، بریا هەموو گوناحەکانم وابوایەن، چجار نابەخشرێ». وەحی هاتە سەر هەندێ لە پێغەمبەران کە: «سەیری وردی گوناح مەکە، سەیری گەورەیی گوناح بکە کە لە فەرمانی خودانی خۆت لات داوە». هەروەها، هەرچەند بەندە فرەتر گەورەیی پەروەردگار بناسێ، گوناح لە لای گەورەتر دەبێ. یەک لە یارانی پێغەمبەر گوتی: «ئەنگۆ گوناح دەکەن و بە تاڵەموویەکی دەزانن، کەچی ئێمە هەریەک لەوانە بە چەن بەرانبەری کێوێک دەزانین». بە کورتی، رق و تووڕەیی پەروەردگار لە گوناحاندا شراوەیە، تەنانەت رەنگە لەوەدا بێ کە تۆ بە ئاسانی دەگری؛ هەروەک فەرمووی:

وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ[1].

**سێیەم**، ئەوەیە کە بە گوناح شادبێ و ئەو گوناحە بە دەسکەوت و سەرکەوتنێک بزانێ و شانازی پێوە بکاو رەنگە بە خۆیدا هەڵبڵێ و بڵێ فلان‌کەسم خاپاندووە، ماڵیم بە تاڵێن بردووە، سەروگوێلاکیم ماڵیوەو جنێوم پێی داوەو شەرمەسارم کردووەو لەشەڕەقسەدا بەزاندوومەو وەکی ئەم شتانە. ئەوەی بە فەوتانی خۆی شاگەشکە بێ و شانازی بە خۆوەبکا، دیارە دڵی رەش داهاتووەو لەو سۆنگەوە خۆی کوشتووە. پەنا بە خوا!

**چوارەم**: ئەوەیە کە دەبینێ گوناحەکانیان لە ژێر پەردەدا شاردۆتەوە، وادەزانێ ئەمە سەرنج و بەزەیی پەروەردگارە لە ئاستی خۆیدا و ناترسێ لەوەی کە ئەم شرانەوەیە مۆڵەت دان بێ تا بەرەبەرەو بە تەواوی بیفەوتێنێ.

**پێنجەم**، ئەوەیە کە ئەو پەردەی خوا لەسەر گوناحەکانی کێشاویە، لای بداو گوناحەکانی ئاشکرا کا. رەنگە بەم کارەی دنەی کەسی‌تریش بدا و لە دڵیدا پاپای گوناح بەدی بێنێ و ئۆباڵی دنەی ئەو کەسە بۆ گوناحی بکەوێتە ئەستۆ، هەروەها گەر بەڕاشکاوی دنەی بدا و هۆکارەکانی ئەو گوناحەی بۆ تەیار کا، گوناحەکەی پتر دەبێ. پێشوونان گوتوویانە: «هیچ شت وەکوو ئەوە گوناح نییە کە گوناح‌کردن لە چاو موسوڵماندا ئاسان بکرێ».

**شەشەم**، زاناو پێشەوایەک گوناح کاو بە کردەوەکانی خەڵکی لەسەر گوناح‌کردن بوێر و ئازا کاو بڵێن: گەر خراپ بایە، ئەو نەیدەکرد. وەکوو ئەوەی زانا جلکی ئاورشیمین دەبەرکا، پەرای خونکاران بکاو ماڵیان لێ وەربگرێ و لە شەڕەقسەدا قسەی سووکانە دەربدا، تیزوتانە بدا لە دۆستانی، شانازی بە زۆر و زەوەندەبوونی سامانی بکا، شاگردەکانیشی دەدەنە پەی و چاوی لێ دەبڕن. ئەمانیش دەبنە وەک مامۆستایان، شاگردەکانی ئەمانیش چاویان لێ دەکەن و هەریەکەیان کەسانی‌تر دەفەوتێنن. کە خەڵکی هەر شارێ سەیری یەکێکیان کەن، ناچار ئۆباڵی هەموویان دەکەوێتە گەردنی پێشەوای یەکەم. بۆیە گوتوویانە: «خۆزگە بەوەی دەمرێ و گوناحەکانیشی دەگەڵی دەمرن». ئەوەی وایکرد هەزارساڵ پاش مردنی گوناحی خەڵکی پێسیری دەگرن. یەک لە زانایانی بەنی ئیسرائیل لە گوناحەکانی گەڕایەوە، وەحی هاتە سەر پێغەمبەری سەردەم و پێی گوت:« بڵێ گەر گوناحەکانت هی نێوانی من و تۆ بایەن، هەموویانم دەسڕیەوە، ئێستا کە خۆت تەوبەت کردووە، ئەو خەڵکەی راستەڕێت لێ تێک داون و لە لاڕێدا هەڵوەدان، چی لێ دەکەی؟» لەم سۆنگەوە زانایان لە مەترسیدان، چونکە گوناحێکیان هەزار گوناحەو پەرستنێکیان، هەزار عیبادەتە، چونکە پاداش و

---

١ - (قورئان، ١٥/٢٤) لاتان وابوو زۆر هاسانە؛ کە ئەم کارە بەم خودا زۆر گەورەبوو. (هـ).

سزای ئەو کەسانەش کە پێڕەوییان لێ دەکەن، پێیان دەدرێ. لەم سۆنگەوە لەسەر زانایان فەرزترە کە گوناح نەکەن، کە کردییان ئاشکرای نەکەن، تەنانەت گەر موباحێ ببێتە هۆی ئەوەی خەڵکی بۆ گوناح ئازاتر بن، دەبێ خۆی لێ بپارێزێ.

زەهری دەڵێ: «ئێمە پێشتر گاڵتەو یاریمان دەکردو قاقای پێکەنینمان هەبوو، ئێستا کە بوومەتە پێشەوا، لە بزەش دڵنیا نیم». زۆر دزێو و ناڕەوایە کە گوناحی زانا بگێڕدرێتەوە، چونکە خەڵکی زۆر دەکەونە سەر هێڵی لارو بوێرانە گوناح دەکەن. کەواتە، شاردنەوەی هەڵەی سەرجەمی خەڵک پێویستەو هی زانایان پێویستتر.

## شرۆڤەی مەرجی تەوبەو دیاردەکانی

بزانە، راستەقینەی پاشگەزبوونەوە، پەشیوانییە و ئاکامی ئەو پەشیوانییە، خۆشەویستیەکە کە لە دڵدا چی دەبێ، بەڵام دیاردەی ئەم پەشیوانییە ئەوەیە کە بەندە بەردەوام لە خەم و پەژارەدا بێ و کاری گریان و شین و شەپۆڕ بێ. ئەوەی خۆی لەسەر لێواری فەوتان و نەمان دەبینێ، چۆن لە خەم و پەژارە دەرباز دەبێ؟ گەر کەسێ منداڵێکی نەخۆشی بێ و پزیشکێکی مەسیحی یان گاور بڵێ نەخۆشیەکەی پڕمەترسییە و ڕەنگە هەستانی بۆ نەبێ، دیارە کە چ ئاورێکی خەم و کەسەر بەردەبێتە گیانی بابی نەخۆش. دیارە، نەفسی مرۆڤ هێژاترە لە منداڵی، خوداو پێغەمبەری خوداش راسبێژتر لە پزیشکی گاورن، مەترسی فەوتانی دواڕۆژ گەلێک مەزنترە لە مردنی منداڵە، کرێتبوونی گوناح لە لای پەروەردگار، ئاشکراترە لە ئەنجامی مردن بۆ نەخۆشی. کەواتە ئەوەی لەم ترسە خەم داینەگرێ، ئاشکرایە کە بە زیانی گوناح باوەڕی نییە. هەرچەند ئەو ئاوری پەشیوانییە تیژتر بێ، زۆرتر گوناحەکان دەسوتێنێ. چونکە ئەو رەشی و زەنگارەی بە هۆی گوناحەوە نیشتۆتە سەر دڵ، تەنیا بە ئاوری پەشیوانی و هەناسەساردی دەتوێتەوە. لەم سووتان و هەڵقرچانەدا، دڵ بێخەوش و ناسک و پاراو دەبێ.

لە خەبەردا هاتووە کە «لەگەڵ تەوبەکاران دابنیشە، چونکە دڵیان ناسکترە». هەرچەن دڵ پاکژتر دەبێ، پتر بێزی لە گوناح دێ و شیرینی گوناحی لەلا تفت و تاڵ دەبێ. یەک لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل تکای بۆ یەکێک لە نەتەوەکەی دەکرد کە خودا تۆبەی لێ قبوول بکا. وەحی هات کە: «سوێند بە گەورەییم! گەر سەرلەبەری خەڵکی زەوی و ئاسمانەکان تکای بۆ بکەن، تا شیرینی ئەو گوناحەی لە دڵدا بێ، لێی نابوورم». بزانە هەرچەن سروشتی مرۆڤ حەز لە گوناح دەکا، بەڵام بۆ مرۆڤی تەوبەکار، وەکی هەنگوینی ژاراوییە. هەرکەس جارێک چەشتوویەو ئازارەکەی دیوە، هەرگا بیری لێ بکاتەوە، لەبەر کرێتی، موو لەسەر لەشی راستەو دەبێ و شاوەت و شیرینییەکەی لەبەر

ترسی زیان دادەپۆشرێ و هیچی نامێنێ. دەبێ ئەم تفتیە لە هەموو گوناحێکدا ببینێ؛ چونکە ئەو گوناحەی کە تووشی بوو، بۆیە وەکوو ژاربوو چونکە پەروەردگار بێزی لێ بوو؛ هەموو گوناحەکان ئاوەهان و خودا رقی لێیان هەیە.

تامازرۆییەک کە لە پەژیوانی لە دڵدا دێتە دی، بۆ سێ شتە: ئێستاو رابردوو و داهاتوو.

**ئێستا:** ئەوەیە کە پشت لە هەرچی گوناحە بکاو هەرچی لەسەر فەرز کراوە یەک بە یەکی جێبەجێ کا.

**داهاتوو:** بڕیار دەدا کە تا کۆتایی تەمەنی لەسەر ئەم بیرەی بەردەوام و پشوودرێژ بێ و بە دڵ و بە لەش دەگەڵ پەروەرندەی پەیمان دەبەستی کە چیدی ئاوڕ لەو گوناحەی نەداتەوەو لە بەجێهێنانی فەرزەکانیدا کەل و کوتەر نەبێ، وەک نەخۆشێ کە بزانێ میوەیەک زیانی بۆی هەیە و بڕیار دەدا کە چجار لێی نەخواو لە کاتی ئەو بڕیاردانەدا، هیچ دڕدۆنگی و سستیەک نەبێ؛ هەرچەند رەنگە دواتر ئارەزووی نەفس بە سەریدا زاڵ بێ. هەروەها تەوبە تا سەر نابرێ مەگین بە دوورەپەرێزی و بێدەنگی و پارووی حەلاڵ کە بە دەستی هێنابێ، یا خۆ بتوانێ بە دەستی بێنێ. تا واز لە لێڵی و شوبهە نەهێنرێ، تەوبە تەواو نییە؛ تا شاوەتەکان تێک نەشکێنێ، ناتوانێ واز لەو شوبهانە بهێنێ. دەڵێن هەرکەس ئارەزووی نەفسی بە سەردا زاڵ بێ و حەوت جار بە کۆشەوەی زۆر واز لەو ئارەزووە بێنێ، بۆی ئاسان دەبێ.

**رابردوو:** ئەوەیە کە رابردووی قەرەوی کاتەوەو وردبێتەوە بە رابردوودا و بزانێ چ مافێکی خوداو بەندەکانی خودای لەسەرە.

مافەکانی خودا دووبەشن: بەجێهێنانی فەرزەکان، دووری لە گوناح.

*بەجێهێنانی فەرزەکان*: دەبێ بە رابردووی خۆیدا بچێتەوەو وردبێتەوە و بزانێ لەو دەمەیڕا باڵق بووە، رۆژێک بووە نوێژی فەوتابێ، جلکی پاکژ نەبووبێ، نییەتی لە نوێژ، یان رۆژوو، یاخۆ هەر عیبادەتێ کە نییەت تێیدا گرینگ بێ، دروست نەبووبێ - چونکە نەیزانیوە- یاخۆ بۆشاییەک کەوتبێتە سەرچاوەی بیروباوەڕیەوە و گومانی تێدا کردبێ، دەبێ هەمووی بگێڕێتەوە؛ هەروەها لەو رۆژەوە ماڵوسامانی هەبووەو لە یارمەتی هەژاران خۆی بواردووەو یاخۆ دەفروجامی زێر و زیوی هەبووە و لەزەکاتیان خۆ گێل کردووە، حسێبی هەموویان روون کاتەوەو هەمووی بدات، یا لە رۆژووی رەمەزاندا کورتی کردووە، یان نییەتی لە بیر کردووە، یاخۆ نییەتی تەواو نەبووە، ئەمیش هەروایەو دەبێ بە جێی بێنێتەوە. هەرچی لەم بابەتانە دڵنیابوو کە کەل و کوتەرە، بیگێڕێتەوەو لە هەرچیش دڕدۆنگ بوو، خۆی بڕیاری لەسەر بدا.

بەڵام *گوناحەکان*: دەبێ بەرابردوویدا بچێتەوەو بزانێ لەو کاتەوە باڵغ بووە، دەست وپێ و زمان و

گوێ و ورگی و هەموو ئەندامانیتری چ گوناحێکیان کردووە. گەر گوناحی زەلامی کردووە، وەکوو زینا و نێربازی و دزی وخواردنەوەو ئەوانەی حەدیان لەسەر پێویستە، دەبێ لە هەموویان پاشگەز بێتەوە. نیاز نییە لە لای خونکار ئاشکرای کا تا حەدی لێ بدرێ، بەڵکوو دەبێ بیشارێتەوەو بە بەندەگی و عیبادەت قەرەبووی کاتەوە. بۆ گوناحە وردەکانیش هەروا. وەکوو ئەوەی کە سەیری ژنی بیانی کردبێ، بە بێ دەسنوێژ قورئانی هەڵگرتبێ، بە لەشی پیس لە مزگەفتدا دانشتبێ، یان گوێی لە دەنگی سازوگۆرانی گرتبێ، هەریەکەیان بە دژی خۆی قەرەوی کاتەوە تا ئاسەواری پاکژبێتەوە؛ چونکە خودا دەڵێ: إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ[1]. بەلام ئەو دژ بەو گوناحە بێ، زۆرتر کاریگەرە: کەفارەی ژنەفتنی دەنگی سازو گۆرانی، گوێ گرتنەلە دەنگی قورئان و کۆڕی زانست؛ کەفارەی بەلەش پیسی دانیشتن لە مزگت، مانەوە لە مزگەوت و پەژارانە سەر عیبادەتە؛ کەفارەی دەستی بێ دەسنوێژ دان بە قورئان، ڕێزگرتنی قورئان وزۆر خوێندنەوەیە؛ کەفارەی خواردنەوەی مەی ئەوەیە کە خواردنەوەیەکی خۆش و حەلال کە زۆریش حەزی لێیە، نەیخواو بیداتە سەدەقە، تاهەر تاریکییەک کە ئەو مەیە لە دلێدا پێکی هێناوە، بە تیشکی ئەم بیسڕێتەوەو پاکژی کاتەوە. هەروەها کەفارەی هەرخۆشیەک کە لە دونیا بردوویە، ئازارێکە کە لە دونیا بەری دەکەوێ و تووشی دەبێ؛ چونکە شادی وخۆشی دونیا، دڵ دەکاتە هۆگری خۆی و گیرۆدەی دەکا، بەلام هەر ئازارێک کە لە دونیاوە پێی دەگا، ئەو هۆگرییە لاواز دەکاو رق و بیز لە دونیای لە جێ دەڕوێنێ.

بۆیە لە خەبەردا هاتووە کە: «هەر ڕەنج و ئازارێک کە تووشیاری باوەڕدار دەبێ، گەر دڕکێکیش بێ کە لە پێی ڕۆچووبێ، کەفارەی گوناحەکانیە». پێغەمبەر فەرمووی: «بڕێ گوناح، بێجگە لە خەم و پەژارە هیچ کەفارەیەکی نییە». لە خەبەرێکیتردا هاتووە کە: «بڕێ گوناح، تەنیا خەمی خێزان و دابینکردنی بژیویان کەفارەیە». عایشە دەڵێ: «بەندەیەک کە هەڵەوپەڵەی زۆری هەیەو عیبادەتی وای لە هەماندا نییە کە قەرەوی هەڵەکانی بکاتەوە، پەروەردگار خەمێکی بەسەر دڵدا دەبارێنێ تا هەڵەکانی بسڕێتەوە».

ڕەنگە بڵێی: «خۆ ئەم پەژارەیە بە ویستی خۆی نییە، تەنانەت ڕەنگە لەسەر کای دونیا خەمین بێ و ئەمە بۆ خۆی گوناحە، چۆن دەبێتە کەفارە؟» وانییە کە بیر دەکەویتەوە؛ چونکە هەرچی دڵت لە دونیا وەڕس کا، ئەوە خێری تۆی تێدایە، هەرچەن بەویستی تۆش نەبێ؛ چونکە گەر دڵت تەژی لە شادی گەیشتن بە ئامانج بێ، دونیات بۆ دەبێتە بەهەشت. یووسف لە جوبرەئیلی پرسی: «چەندەخەم و خەفەتت بە دڵی ئەوپیرە پیاوەدا -واتە بابم یاقوب- کرد؟ » گوت: «خەمی دڵی سەد دایکی جگەر سووتاو». گوتی:«بەم خەمە چ پاداشێکی هەیە؟» گوتی:«پاداشی سەد شەهید».

---

١ - (قورئان، ١١٤/١١) چونکە چاکە، خراپەکان دەسڕنەوە.

بەلام مافی خەلکی: دەبێ لە هەموو پێوەندییەکانی خۆی و خەلکی وردبێتەوە، تەنانەت لە پەیڤین و ئاخاوتندا، هەمووی حسێب کا، تا هەرکەس مافێکی لەسەرە، بەماڵوسامان یان ئەوەی کە دلی کەسێکی ئێشاندبێ، یان خوسپەی کەسێکی کردبێ، گەردنی خۆی ئازاد کا و هەرچی دەبێ بدرێتەوە، بیداتەوەو هەرچی دەبێ گەردن ئازادی بخوازێ، دەبێ بیخوازێ؛ گەرخوێنی کەسێکی لە ئەستۆیە، دەبێ خۆی بداتە دەس خاوەن خوێنەوە تا یان تۆلەی لێ بستێنێتەوە یان بیبەخشێ، هەروەها هەرچی لە مالی خەلکی، لە درهەمێ، دانگێ یان تۆزکالێ کەوتبێتە سەری، دەبێ هەر لەم دونیایەدا خودانی ئەو مالە ببینێتەوەو پێی بداتەوە، گەر نەیدیەوە، بیداتە میراتبەرەکەی. ئەمەش گەلێک دژوارە، بە دانستە بۆ خەلکی بازاڕ کە پێوەندییان گەلێک زۆرە. باسی خوسپەش لە هەمووان دژوارترە، چونکە ناتوانێ هەموویان ببینێتەوە. کە هیچ ڕێگایەک نەما بۆ ئەوەی گەردن ئازادی لێ بخوازێ، دەبێ ئەوەندە عیبادەت کا، کە لە دواڕۆژدا مافی ئەو کەسەیان لێ کەم کردەوە، بە قەدەر خۆی بمێنێتەوە.

**سەرنج**

بزانە، هەرکەس لە درێژایی تەوبەدا تووشی گوناح بێ، دەبێ خێرا قەرەبووی کاتەوە. هەشت کار هەیە کە دەبێ پاش تووش ببوونەوە بە گوناح لە دلیدا بێنە دی و کە هاتن نیشانەی کەفارەی گوناحەکانین:

**چوار لە دلدا:** یەکەم تەوبە یان نیازی تەوبە؛ دووەم حەز بەوەی کە ئیدی ئەو کارە نەکاتەوە؛ سێهەم تۆلەیان لێی ئەستاندبێتەوە؛ چوارم هیوا بە لێبوردن.

**چواریش لە لەشدا:** یەکەم ئەوەی کە دوو ڕەکات نوێژ بخوێنێ و حەفتا جار «استغفرالله» بلێ و سەدجار بلێ «سبحان ربی العظیم و بحمده» دووەم، بەو ڕادەی کە دەتوانێ، خێرو سەدەقە بدات؛ سێهەم، ڕۆژێک ڕۆژوو بگرێ؛ چوارەم، لە هەندێ ئاساردا هاتووە کە دەسنوێژێکی بەدەمو بشواو بڕواتە نێو مزگەفتەوەو دوورەکات نوێژ بخوێنێ.

لە خەبەردا هاتووە کە: «کە لە نهێنیدا گوناحێکت کرد، لە نهێنیشدا عیبادەتێ کە تا ببێتە کەفارە بۆی؛ کە بە ڕاشکاوی کردت، بە ڕاشکاویش عیبادەتێ کە». هەروەها دەبێ بزانی داوای لێبوردن گەر بەزار بوو و دل هیچ بەشێکی نەبوو، کەلکی زۆر کەمە. بەشدار بوونی دل ئەوەیە کە ترسێکی تێدابێ و بە گریان و هەنسکەوە داوای لێبوردن بکەی، هەروەها دلەڕاوکێ و شەرمەساریشی تێدا بێ. کەوابوو، هەرچەند بڕیاری تەوبەی نەدابێ، بەلام هێوادارە بە لێبوردنی پەروەرندەی. بەکورتی داوای لێبوردن بە زمان کە دل تێیدا بەشدار نەبێ، لە قازانج بێبەش نییە، چونکە هەرچەند بینایی چاوان

بەرگری کردووە کە زمان بەبێکەڵک و قازانج بگەڕێ، بەڵام پێی لە بێدەنگی چاکترە؛ چونکە کە زمان خووی کرد بە چاکە، زۆرتر حەز دەکا بە وشەی تۆبەو ئەمەش گەلێک چاتر لەوەیە کە رموودەی لەحنەت ناردن و قسەی بێ کەڵک بێ.

مووریدێک بە عوسمانی مەغربی گوت: «جار هەیە زمانم خەریکی یادی خودایەو دڵ لەوێ نییە». گوتی: «شوکرانەبژێر بە کە ئەندامێکت لە پەرایی خودانیدا ماوەتەوە». لەمەشدا شەیتان فێڵێکی هەیەو پێت دەڵێ: زارت لەیادی پەروەرندەت داخە، کە دڵ تەیار نەبوو، یادکردنی خودا بێ حورمەتییە. خەڵکی لەپەرسڤ گەڕاندنەوەی شەیتاندا بوونەتە سێ دەستە:

**یەکەم**: پێشوونان کە گوتیان: راست دەکەی، بەڵام بۆ کوێری تۆ دڵیش تەیار دەکەم. ئەمە زامی شەیتان دەکولێنێتەوە.

**دووەم** ستەمکار، کە گوتی راست دەکەی، یادی بی دڵ چ کەڵکی نییە، وس و بێدەنگ بوو و پێی وابوو کە زۆر زیرەکە؛ بەڵام لە راستیدا هەستا بە دۆستی و ئاریکاری شەیتان.

**سێیەم**، ناونجی، کە گوتی راستە دڵم بۆ تەیار نابێ، بەڵام یادی سەرزارەکی چاتر لە بێدەنگییە، هەرچەند یادی بە دڵ هێژاترە؛ هەروەک خونکاری چاترە لە سەڕافی؛ بەڵام سەڕافی هێژاترە لە قومەشکێنی. هەروەها مەرج نییە هەرکەس خونکاری بۆی پێک نەهات، واز لە سەڕافیش بێنێ وببێتە قومەشکێن.

## شرۆڤەی دەرمانی تەوبە کردن

بزانە، دەرمانی ئەو کەسانەی خۆیان لە پاشگەزبوونەوە دەبوێرن، ئەوەیە بزانی بۆچی لەسەر گوناح سوورن و پێدادەگرن. ئەو هۆکارانە پێنجن و هەریەکەیان دەرمانێکی جیاوازی هەیە:

**یەکەم** ئەوەیە کە باوەڕی بە دوارۆژ نییە، یان لێی دڕدۆنگە. دەرمانی ئەم دەردە، لە بەشی فریوخواردن، کۆتایی پاژی کوشندەکاندا هاتۆتە گوتن.

**هۆی دووەم** ئەوەیە کە ئارەزووی نەفس وا بەسەریدا زاڵ بووەو سواری ملی بووە کە توانی وازهێنان و گەڕانەوەی نییە، هەروەها شاوەتەکان واچەتریان بەسەریدا کێشاوە کە هیچ ئاگای لە دەوروپشتی خۆی نەماوەو لە مەترسی دوارۆژ ئاگای براوە. پەردەی بەرچاوی زۆربەی خەڵکی شاوەتەکانن. پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم دۆژەهی ئافراند، بە جبرەئیلی گوت: "بنوارە"؛ کە سەیری کرد و کارەساتەکەی بینی، گوتی: "بە گەورەیی خۆت! هەرکەس تاریفی ئێرەی بیست قەد نایێتە ناوی". پاشان پەروەردگار شاوەتەکانی لە دەوروپشتی دۆژەهدا ئافراند، گوتی: «بنوارە". سەیری کردو گوتی: "زۆر دەترسم کەس نەمێنێ کە نەکەویتە نێو دۆژەهەوە". بەهەشتی خولقاند و

گوتی: "بڕوانە". کە سەیری کرد گوتی: "کەس نییە پەسنی ئێرە بژنەفێ و بلەزوبەز بۆ ئێرە غار نەکا". پاشان رەنج و ئازارو کارگەلی دژواری لە چوارتەنشتی بەهەشت دانا، گوتی: "بڕوانە". سەیری کردو گوتی: "سوێند بە گەورەییت! زۆر دەترسم لەبەر ئەم هەموو رەنج و ئازارە، کەس توخنی بەهەشت نەکەوێ".

**هۆی سێیەم** ئەوەیە کە بەڵێنی دواڕۆژ قەرزەو دونیا نەخت. سروشتی مرۆڤ حەزی لە نەختەو هەرچی قەرزەو لە چاو دوورە، لەدڵیشی دوورە.

**هۆی چوارم** ئەوەیەکە هەرکەس کە بڕوادارە، هەردەم بە نیازە پاشگەز بێتەوە، بەڵام وەدرەنگی دەخاو دەڵێ سبەی. کە سبەیش شایەتێکی نوێ دێتە ئاراوە، دەڵێ ئەمەش دەکەم وچیدی توخنی ناکەوم.

**هۆی پێنجم** ئەوەیە کە گەرەک نییە کە گوناح مرۆڤ بباتە دۆژەە، بەڵکوو بۆی هەیە پەروەردگار لێی ببوورێ. مرۆڤ لە ئاستی خۆیدا گومانی چاکە دەبا، کاتێ شاوەتێکی بەسەردا زاڵ دەبێ، دەڵێ خوا دەمبوورێ و هیوای بە بەزەیی خودا هەیە.

دەرمانی یەکەم ئەوەیەکە بڕوای بە دواڕۆژ نییە، پێشتر راڤەی ئەمەیان کردووە.

بەڵام دەرمانی ئەوەیان کە دواڕۆژ بە قەرز دەزانێ و نەخت وێڵ ناکا کە قەرز بگرێ و دواڕۆژ کە لە چاوی دوورە، لە دڵی خۆی دووری دەزانێ، ئەوەیە کە دەبێ ئارخەیان بێ هەرچی لە هاتنی گومان نییە، بە نزیکی بزانێ و هەر ئەوەندەی کە چاوت لێک ناو مردی ئەو قەرزەش دەبێتە نەخت؛ جا رەنگە ئەمڕۆ بێ، یان رەنگە سبەی بێ و یا خۆ بۆی هەیە هەر ئەم ساتە مردن ببێتە میوانت و ئەو قەرزەت بکاتە نەخت و نەختی پێشووت بکاتە قەرز و رابردوو ببێتە خەونێک لە پێش چاوت.

بەڵام ئەوەی کە دەڵێ بڕشتی ئەوەم نییە واز لە ئارەزووەکانی نەفس بێنم، دەبێ پێی بڵێی گەر توانی ئەوەت نییە ساتێ لەسەر دنەی شاوەتت پشوودرێژ و لە سەرخۆ بی، چۆن لەبەر ئاوری دۆژەخۆت رادەگرێ، چۆن توانی دووری لە چێژو خۆشی بەهەشتت هەیە؟ گەر نەخۆش بێ و لە لای دەستی هیچ شت بێجگە ئاوی سارد نەبێ و پزیشکێکی بیانی و بێ دین پێی بڵێ ئەم ئاوە زیانی بۆت هەیە، چۆن بە ئاوەژووی حەزو ویستی دەبزوێتەوەو بە هومێدی ئەوەی چا بێتەوە لەو ئاوە ساردە خۆی دەپارێزێ؟

هەروەها هیوای پادشایی هەتاهەتایی کە خوداو پێغەمبەری بەڵێنیان پێ داوە، جێی متمانەترە بۆ ئەوەی واز لە شاوەتەکانی بێنێ.

بەڵام ئەوەی پاشگەزبوونەوە دەخاتە دواوە، پێی بڵێن دەیخەیتە دواوە تاسبەی، کەچی هاتنی بەیانی بە دەستی تۆ نییەو رەنگە ئەو بەیانییە قەد نەگات و تۆش روو لە جیهانی خامۆشان بنی. لەم

سۆنگەوە لە خەبەردا هاتووە کە: «زۆربەی هاوار و ناڵەی خەڵکی دۆژەە، لە وەدرەنگ خستنە». پێی دەڵێن: بۆچی گەڕانەوەو تەوبەی ئەمڕۆت بە سبەی دەسپێری؟ ئەگەر بەوبۆنەوە دەڵێی بەیانی، چونکە تەوبە دژوارە، خۆ بەیانیش هەر ئەمەیە. پەروەردگار هیچ رۆژێکی نەخولقاندووە کە لەو رۆژەدا پاشگەزبوونەوە لە گوناح ئاسان کرابێ. ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە پێی دەڵێن ئەو دارە لە بن دەربێنا، ئەویش دەڵێ ئەم دارە بە هێزەو ریشەی داکوتاوەو منیش لاوازم، دەوەستم تا ساڵێکیتر. دەڵێن سەیری ئەم نەزانەکەن، ساڵێکیتر ئەم دارە پتر بنجی داکوتاوەو تۆش لاوازتر بووی. داری شاوەت هەر رۆژ بەهێزتر لە رۆژی بەرینە، چونکە کاری پێ دەکەی و بەهێزتری دەکەی، کەچی تۆ هەر رۆژ لە دژایەتی دەگەڵی بێ هێزتر دەبێ؛ هەرچەند زووتر بەری پێ بگری، کارت ئاسانترە.

بەڵام ئەوەی دەڵێ من بڕوادارم و پەروەردگار بڕواداران دەبەخشێ، پێی دەڵێن: رەنگە لێت نەبووری و رەنگە چونکە بەندەگی خودا بەجێنەهێنێ، داری باوەڕت لاواز بێ و لە ئاویلکە و گیانکەنشتدا لە ریشە دەربێ. چونکە باوەڕ دارێکە کە ئاو لە بەندەگی دەخواتەوە، گەر خواردنی بەرنەکەوتبێ لە مەترسی کەوتن دایە. تەنانەت باوەڕی بێعیبادەت و بە گوناحی زۆرەوە، وەکوو پیاوێکە بە چەنای چەن دەردەوە، کە هەرسات بۆی هەیە گیانی لە لەش بتارێ. گەر باوەڕی بە ساغی بەدەر برد، رەنگە بیبوورن، بۆشی هەیە سزا بدرێ؛ لە راستیدا سەرلەبەری پێغەمبەران بۆیە ناردراون تا پێت بڵێن گوناح دەبێتە هۆی سزادان. بە هیوای ئەوەوە دانیشتن، نەزانییە. ئەمە چیرۆکی ئەو زەلامەیە هەرچی هەیە لە ماڵوسامان و خانووبەرە، تێکی دەداو دەیفەوتێنێ و خێزانەکەی بە برسی دێڵێتەوەو دەڵێ رەنگە بڕۆنە نێو کەلاوەیەک و گەنجێ ببیننەوە؛ یان لە کاتی تالانی شاردا کالاو کۆتالی نەشارێتەوەو دەرکی خانووی دانەخاو بڵێ رەنگە کاتێ ئەم جەردانە گەیشتنە بەردەرکی من بمرن، یاخۆ بیرو هۆشیان تێک بچێ و نەینە ژووری؛ ئەمانە هەمووی بووز دەخواو بۆ لێبوردنیش هەروایە، بەڵام دڵنیابوون لەم و ئاگادارنەبوون، هۆی گێلی و گەوجییە.

### سەرنج

ناکۆکی هەیە لەسەر ئەمەی کە گەر کەسێک لە بڕێ لە گوناحەکان پاشگەز بێتەوە نەک لە هەموویان، دروستە یان نە. هەندێ کەس دەڵێن: زۆر ئەستەمە کەسێک لە زیناکردن پاشگەز بێ و کەچی لەسەر خواردنەوەی مەی بەردەوام بێ، چونکە گەر بۆ ئەوە نایکا کە گوناحە، خواردنەوەش هەر گوناحە؛ کەواتە نەشیاوە کە کەسێک لە خواردنەوەیەک وازبێنێ و لە خواردنەوەیەکیتر واز نەهێنێ؛ چونکە هەردوویان وەکوو یەکن و هەردوویان هەڵەو تاوانن. بەڵام دروستەکەی ئەوەیە کە بۆی هەیە لە گوناحێ واز بێنێ و لێی پاشگەز بێتەوەو لەویتر نە، وەکوو لە زینا تەوبە دەکاو لە

خواردنەوە نە؛ چونکە زانیویە زینا گوناحێکی ئەستەمترەو لەوەی دژوارترە وازی هێناوەو تەوبەی کردووە؛ یان بزانێ خواردنەوە لە زینا بەدفەڕترە؛ چونکە خواردنەوە هەم تووشیاری زینای دەکاو هەم گوناحی‌تر؛ یان رەنگە لە خوسپە تەوبەکاو لە خواردنەوە پاشگەز نەبێتەوە و بڵێ ئەمە چونکە لە مەڕ خەڵکە، مەترسییەکەی گەلێک زۆرە. تەنانەت دەتوانێ لە زۆر خواردنەوە تەوبە کا، نەئەوەی کە قەد نەخواتەوەو بڵێ هەرچەند زۆرتر بخۆیتەوە سزات فرەترەو من دەروستی ئارەزووەکەم نایەم، بەلام دەروستی زۆرخواردنەوەکەی دێم؛ مەرج نییە لە کارێکدا کە دەرۆستی شەیتان نەبم، لەوکارانەش کە دەروستی دێم پێڕەوی لێ بکەم. هەموو ئەمانە دەلوێن.

بەلام ئەوەی کە گوتوویانە «التائب حبیب الله»، قورعانیش دەڵێ: إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ[1].

وادیارە ئەمە ئاستی خۆش ویستنی کەسانێکە کە لە هەموو گوناحێ پاشگەزبوونەتەوە. ئەوەی کە دەڵێ تەوبە لە هەندێ لە گوناحەکان دروست نییە، رەنگە مەبەستی هەر ئەمە بێ. ئەگینا لە هەر گوناحێکی بچووک کە تەوبە دەکرێ، ئەو تەوبە قەرەبووی ئەو گوناحە دەکاتەوەو ئەو گوناحە دەسڕێتەوە. هەروەها بە یەکجار پاشگەزبوونەوە لە هەموو گوناحان زۆر ئەستەمەو زۆرتر وایە کە یەک بە یەک لە گوناحان تەوبە دەکرێ؛ بەرادەیەک کە بە ئەنجامی دەگەیەنێ، پاداشی پێ دەدرێ. والله اعلم بالصواب.

---

١ - (قورعان، ٢/٢٢٢) خوا لەو کەسانە خۆشی دێ کە پەژیوانن و دەیانەوێ بەپاک و خاوێنی بژین. (هـ)

## بنەمای دووەم - پشوو درێژی و شوکرانەبژێری

بزانە، بەبێ‌پشوودرێژی، تەوبە پێک نایە، تەنانەت هیچ بەندەگی و وازهێنان لە گوناحێک بەبێ پشوودرێژی ناگاتە ئەنجام. لەم سۆنگەوە بوو کاتێ لە پێغەمبەریان پرسی: «باوەڕ چییە؟» گوتی: «پشوودرێژی». لە خەبەرێکی‌تردا فەرمووی: «پشوودرێژی نیوەی ئیمانە». بەبۆنەی گەورەیی پشوودرێژییە کە پەروەردگار لە قورعاندا پتر لە حەفتا جار باسی سەبری کردووە و هەر ئاستێ کە بەدەوترە، پشوودرێژی کردە هاولفی؛ تەنانەت پێشەوایی رێگای دینی بە پشوودرێژییەوە گرێداو گوتی: وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ[1]. هەروەها پاداشێکی زۆروزەوەندی بەست بە پشوودرێژییەوەو فەرمووی: إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ[2]. بەڵێنی دابە پشوودرێژان کە هاوڕێیانەو فەرمووی: إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ[3]؛ هەروەها هەر سێکی سەلام و بەزەیی و رێنمایی، بێجگە لە پشوودرێژان بەکەس نەداوە، فەرمووی: أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ[4]. لەبەر گەورەیی و رێزی پشوودرێژییە کە پەروەردگار پایەبەرزو هێژای کردووەو بێجگە لە هەندێ لە نزیکەکانی ئەم هەموو نرخەی نەداوەتە کەس، چونکە پێغەمبەر فەرمووی: انَّ اَقَلَّ ما اُوتیتُمُ الْیقینُ وَ عَزیمةُ الصَّبْر. واتە: کەمترین تشتێک کە پێتان دراوە، دڵنیاییەو پشوودرێژی؛ هەرکەس ئەم دوانەی پێ درا، بڵێ گەر نوێژو رۆژووی زۆرت نییە، هیچ خەمت نەبێ؛ گەر هەر بەو چەشنەی ئەمڕۆ دەگەڵ یارانتان پشوودرێژن بەردەوام بن، پێم خۆشترە لەوەی کە هەر

---

١ - (قورئان ٢٤/٣٢) لەوانیشدا چەند کەسێکمان کردە رێبەر، کە هەر بە فەرمانی خۆمان رێنوێنی مەردم بکەن، چونکە توانی خۆ راگرتنیان تێدا بوو؛ بە تەواوی باوەڕیشیان بە نیشانمان هێنابوو. (هـ)

٢- (قورئان ٣٩/١٠) بێ‌گومان کەسانەی خۆ راگرن، بە تەواوی و بێ‌حساب پاداشی خۆیان وەردەگرن. (هـ)

٣ - (قورئان ٢/١٥٣) خوا دەگەڵ خۆڕاگرانە. (هـ)

٤- (قورئان، ٢/١٥٧) خێر و بێر و بەزەیی پەروەرندەیان بۆ دەبارێ و شارەزا لەڕێ ئەوانن. (هـ)

یەکتان بە قەدەر هەمووتان عیبادەت کا؛ بەڵام زۆر دەترسم پاش من ڕێگەی دونیاتان بۆ ئاوەڵا بێ و ئاوڕ لە یەکتری نەدەنەوەو ئاسمانیش ئاوڕ لە ئەنگۆ نەداتەوە. هەرکەس پشوو درێژی کاو چاوەڕوانی پاداش بێ، سەر لە بەری پاداشەکەی وەردەگرێ؛ پشوودرێژو بەکاوەخۆبن، چونکە دونیا کەم تەمەنەو پاداشی خودا هەتاهەتایە: مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ[1]. ئەم ئایەتەی بە تەواوی خوێندەوە. پەیغەمبەر فەرمووی: «پشوودرێژی گەنجێکە لە گەنجینەکانی بەهەشت». دیسان فەرمووی: «گەر پشوودرێژی پیاوێک بایە، پیاوێکی دەهندە بوو. پەروەردگار پشوودرێژانی خۆش دەوێ». وەحی هاتە سەر داوود و گوتی: «لە ئاکاردا چاو لە من کەو لە ئاکارەکانی من یەکیان ئەوەیە کە پشوودرێژم». عیسا گوتی: «ئاگەن بەو شتەی دەتانەوێ تا پشوودرێژ نەبن لەسەر ئەو شتەی ناتانەوێ»[2]. پێغەمبەر تاقمێ لە ئەنساری بینی و گوتی: «ئێوە بڕوادارن؟» گوتیان: «بەڵێ». فەرمووی: «دیاردەی بڕواتان چییە؟» گوتیان: «لە بوون و فراوانیدا شوکرانەبژێرین، لە مەینەت و نەبوونیدا پشوودرێژین و ئەوەی ویستی خودا بێ ئێمەش پێی شادین». فەرمووی: «سوێند بە خودانی کەعبە کە باوەڕداران هەر وان». عەلی گوتی: «پشوودرێژی بۆ باوەڕ، وەکی سەرە بۆ لەش؛ ئەوەی سەری نەبێ، لەشیشی نییەو ئەوەش پشوودرێژ نەبێ، باوەڕی نییە».

## ڕاستەقینەی پشوودرێژی

بزانە، پشوو درێژی تایبەت بە مرۆڤە؛ چونکە ئاژەڵان پشوودرێژ نین و گەلێک ناتەواون، فریشتەکانیش نیازیان بە پشوودرێژی نییە، چونکە زۆر تەواون و لە ئارەزووی نەفس رزگارن. ئاژەڵان لە ژێر ڕکێفی شاوەتدان و بێجگە لە داخوازی شاوەت، چ داوایەکی تریان نییە؛ فریشتەکانیش لە نێو ئەڤینی پەروەردگاردا نوقمن، ئەمانە هیچ تەگەرەو کۆسپێکیان بۆ نایەتە دی تا بە پشوودرێژی و خۆڕاگری بەرگری لێ بکەن.

بەڵام مرۆڤ، سەرەتا لەسەر ڕێچکەی چوارپێیان رسکاوەو ئارەزووی خواردن و جووت بوون و بەرگ و خشڵ و کەیف و کایەی بە سەردا داسەپاوە؛ کە پێگەیشت، ڕووناکیەک لە ڕووناکی فریشتەکان لە ناخیدا هاتە دی، بە هۆی ئەو ڕۆناهییەوە، ئەنجامی کارەکان دەبینێ، هەروەها دوو

---

١- (قورئان ١٦/٩٦) ئەوەی لەلاتانە لەبەین دەچێ؛ ئەوەی لەلای خودا هەیە، هەر دەمێنێ و ئەو کەسانەی خۆڕاگربوون، لە بەرانبەر کردەوەیان -بە زیادەوە- بۆیان تێهەڵدێنینەوە.

٢ - واتە تا لە بەرانبەر ئەوشتەی ناحەزو ناشیاوە خورانەگرن، ناگەن بەوشتەی شیاوەو حەزتان لێیە.

فریشتەیان بۆ تەرخان کردووە کە چوارپێیان لەوە بێ بەشن: یەک لەم فریشتانە راستەڕێی پێ شان دەدا و بە تیشکی خۆی چاک و خراپی پێ دەنوێنێ و ئەنجامی کارەکانی بۆ روون دەکاو لە بەرتیشکی ئەم رووناکیەدا هەم خۆی و هەم پەروەردگاری دەناسێ و دەزانێ کە ئەنجامی ئارەزووەکانی نەفس، زیان و خەسارو تێکچوونە، هەرچەند لە کاتی پێک هێنانیدا زۆر خۆشە، هەروەها پێی دەنوێنێ کە خۆشییەکان زۆر کورتن، کەچی رەنجی ئەو خۆشییانە دوور و درێژە. چوار پێیان لەم رێنماییە بێبەشن. بەڵام ئەم رێنماییەی بۆ بەس نییە، چونکە کە دەزانێ زیانکارەو توانی بەرگری لەوەی نییە، چ قازانجێکی بۆ هەیە؛ هەروەک نەخۆش کە دەزانێ نەخۆشییەکەی دەیفەوتێنێ، کەچی دەروستی نایەو بەرگری لێ ناکرێ، چ کەڵکێکی بۆی هەیە. بۆیە پەروەردگار فریشتەیەکی‌تری ناردە یاریدەی تا هێزو خوستی پێ بداو دەروستی ئەو زیانانە بێ و بەر بە فەوتانی خۆی بگرێ. هەروەکوو چۆن ئەو نیازەی پێ داوە کە هەوساری شاوەت شل کا، نیازێکیشی بۆ داناوە کە ئەو هەوسارە توند کاتەوەو بە ئاوەژووی نەفس ببزوێتەوە تا لە زیانیداهاتوو دەرباز بێ. ئەم نیاز بە دژایەتییە، هی لەشکری فریشتەکانەو ئەو نیازی‌تر هی سوپای شەیتانە. بە نیازی دژایەتی دەگەڵ شاوەت، دەڵێن هۆی دینی و بەویتر دەڵێن هۆی ئارەزوویی.

لە نێوان ئەم دوو لەشکرە هەر دەم شەڕو ئاژاوەیە و یەکیان کۆسپ و لەمپەرەو ئەویتریان دنەدەر و هەڵخڕێنەر. مرۆڤیش بەردەوام لە دوڕی ئەم دوو داخوازەیە. لەم شەڕەدا گەر هۆی دینی راوەستاو و خۆڕاگر بێ لە بەرانبەر هۆی ئارەزووییدا، بەم خۆڕاگرییە دەڵێن پشوودرێژی. کەواتە، واتای پشوودرێژی ئەمەیە. گەر بەسەر هۆی ئارەزووییدا زاڵ بێ و بیبەزێنێ، بەم زاڵبوونە دەڵێن سەرکەوتن. تا خەریکی شەڕ بێ، بەم شەڕە دەڵێن خەباتی نەفس. کەواتە واتای پشوودرێژی، خۆڕاگری هۆی دینیە لە بەرانبەر هۆی ئارەزوویی. لە هەر کوێڕا ئەم دوو لەشکرە بە گژ یەکتردا نەچووبن، لەوێ پشوودرێژی نییە. لەم سۆنگەوە فریشتەکان پێویستیان بە پشوودرێژی نییەو چوارپێ و منداڵیش توان و خوستی پشوو درێژییان نییە.

«کِرامَ الکاتبین» ئەم دوو فریشتەن کە گوتمان. ئەوەی رێگای بیرو هزرو بەڵگە هینانەوەی بۆ ئاوەڵا بوو، دەبێ بزانێ هەر شتێ کە هاتە دی، هۆیەکی هەیە، کە دوو شت لێک جیاواز بوون، دوو هۆی جیاوازییان هەیە، دەبینێ کە چوار پێ و منداڵ لە سەرەتادا نە رێنومایی کراون، نەش زانیاری ئەوەیان هەیە کە ئەنجامی کارەکانیان بزانن، نە دەخوازێ و نەش دەتوانن پشوودرێژ و بەکاوەخۆ بن، بەڵام لە سەرەتای پێگەیشتندا هەردووکیان بۆی تەرخان دەکرێن؛ دەبێ بزانێ ئەم دوانە بە دوو شت پێویستیان هەیە، ئەم دوو فریشتە کە لەسەر شانی راست و چەپی دانراون، ئەم دوو هۆوەن؛ هەروەها دەبێ بزانێ رێگا دەرکردن بنەماو سەرەتایە، دوابەدوای ئەوە هێزو ورەو ویستی رێگابڕین دێتە ئاراوە.

ئەو فریشتە کە ڕێنومایە، هێژاترو سەرترە؛ کەواتە دەبێ جێگای لە لای ڕاستەوە بێ. سەرۆک تۆی؛ چونکە ئەمانە چاودێران و بریکارانی تۆن، کەواتە ئەمەیان فریشتەی دەستی ڕاستی تۆیە. چونکە ئەم فریشتە بۆ ڕێنوێنی تۆ تەرخان کراوە، کە گوێی بۆ راگری و لەسەر ڕێنوێنی ئەو ڕێگا ببڕی، ئەم گوێ ڕاگرتنەت چاکەیەکە لە ئاست ئەودا؛ چونکە چاوەڕوان نەتهێشتووە، ئەم کارەت بە چاکە بۆ دەنووسرێ. بەلام گەر گوێی پێ نەدەی و چاوەڕوانی بهێلی و وەکوو مندالان و چوارپێیان بدەیتە پەی ئارەزووەکانی نەفست، بە گوناح بۆت دەنووسرێ و ئەمە ستەمێکە کە لە خۆت و لەوت کردووە. هەروەها ئەو هازەی کە ئەو فریشتەی‌تر پێتی دەدا بۆ بەرگری و دژایەتی لەگەڵ شاوەتەکانت، چێژت لێگرت و لە کۆشەوە کۆڵت نەدا، بە چاکە بۆت دەنووسرێ، ئەگینا بە گوناح بۆتی دەنووسن. هەردووی ئەم دۆخانەت لەسەر پەرتووکێ دەنووسن، لە نێو ناخی دلتدا، کەچی لە دلت بەرپیوارە.

ئەم دوو فریشتەو کتێبەکانیان لەم جیهانی ئاشکرایە نین، بە چاوی سەر نایەنە دیتن. کە پێمێردت هاتە سەر و جیهانی خامۆشانت کردە مەنزل و چاوی سەرت قووچان و چاوی دلت کردەوەو بەو چاوە جیهانی مەلەکووتت بینی، چاوت بەم پەرتووکانە دەکەوێ. لە ڕۆژی پەسلانی بچووکدا لێی ئاگادار دەبیتەوە، بەلام لە پەسلانی گەورەدا بە وردی لێی تێدەگەی. پەسلانی بچووک سەرەمەرەگە، هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «مَنْ ماتَ فَقَدْ قامَتْ قيامَتُه»[1]. ئەوەی لە پەسلانی مەزندایە، وێنەی لەپەسلانی بچووکدا ئاشکرایە، ئەم باسەمان بە وردی لە کتێبی «ئەحیا»دا ڕاڤە کردووەو لەم کتێبەدا جێی نابێتەوە.

مەبەست ئەوەیە کە بزانی پشوودرێژی لە شوێنێکە لە شەڕ بێ و شەڕیش لە نێوانی دوو لەشکری دژ بەیەکە. ئەم دوو لەشکرەش، یەکیان لە هۆزی فریشتەکانەو ئەویتریان سەر بە شەیتانە و مەکۆیان سینگی مرۆیە. کەواتە، یەکەم شەقاوی ڕێی دین، خەریکبوون بەم شەڕەیە. سارای سینگی مرۆڤ لە مندالیەوە کەوتۆتە ژێر ڕکێفی سوپای شەیتان و تەنیا پاش پێگەیشتنی مرۆڤە کە لەشکری فریشتەکان دێنە دی. کەواتە، تا سوپای شاوەت تێک نەشکێنێ، ناگاتە سەرتەختی بەختەوەری، تا پشوودرێژیش نەبێ، ناتوانێ ئەم سوپا تێک بشکێنێ. ئەوەش توخنی ئەم شەڕە نەکەوتووە، ئەوەیە کە ملی بۆ سوپای شەیتان ڕاکێشاوەو دانی بە گەورەیی ویدا ناوە. هەرکەسیش کۆتی بەندەیی لە ملی شاوەتی ئالاند و هێنایە ژێر ڕکێفی شەرع، سەرکەوتووە؛ هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «لكنَّ اللهَ أعانَني عَلى شَيطاني وَأسْلَم»[2]، زۆرتر خەریکی بەربەرەکانێیە، هەندێ جار سەرکەوتنەو بڕێ جاریش

---

[1] - هەرکەس کە مرد پەسلانی تێپەڕاند.

[2] - پەروەرندەم لە بەربەرەکانێ دەگەڵ شەیتان ئاریکارم بوو، تا بەسەریدا سەرکەوتم.

پەک کەوتن، جارێ شاوەت هێز دەگرێ و جارێکیش هۆی دینی، هاز لە شاوەت دەبڕێ؛ ئـەم شـووره تەنیا بە پشوودرێژی و خۆڕاگری دەکەوێتە دەست سوپای هۆی دینی.

## شرۆڤەی ئەوەی کە بۆچی پشوودرێژی پاژێ لە بڕوایەو ڕۆژوو پاژێ لە پشوودرێژی

بزانە، باوەڕ بە تەنیا یەک شت نییە، بەڵکوو لق و پۆی زۆری هەیەو جـۆر بـە جـۆرە. هـەروەک لـە خەبەردا هاتووە کە: باوەڕ حەفتا دەرگای هەیە؛ گەورەترینیان پەیڤی «لاالەالاالله»یە و بچووکترینیـان هەڵگرتنی دڕکێ لەسەر ڕێگا. هەرچەند جۆرەکانی گـەلێک زۆرن. بـەڵام بنـەماکانی سـێ چەشـنە: زانیاریەو بارودۆخ و کردن[1]. هیچ پاگەیەک لـە پاگـەکانی بـاوەڕ لـەم سـێیە بـەدەر نییـە؛ بـۆ وێنـە ڕاستەقینەی تەوبە، پەشیوانییەو ئەمە دۆخی دڵە؛ بنەمای لـەسـەر ئـەم زانیارییەیـە کـە گونـاح ژاری کوشندەیە؛ هەروەها بەرهەمی ئەوانـە وازهێنانـە لـە گونـاح و پەرژانـە سـەر عیبـادەت. کەواتـە، ئـەم بارودۆخەو ئەو زانستەو ئەو کردەیە، هەرسێ پێکڕا باوەڕن و باوەڕ بریتییە لـەم سـێیانە. بـەڵام ڕەنگـە کاتی زانین یا خۆ گەیشتن بە زانیاری، پێی ببێژرێ باوەڕ، کەچی ڕاستیەکەی ئەوەیـە کـە لـە زانـین، بارودۆخ دێتە دی و لە بارودۆخ کردە. کەواتە زانیارییەکان وەکـی دارن، ئـاڵ و وێرێـک کـە بـە هـۆی زانیاریەوە بەسەر دڵدادێ، لق و پۆی دارن و کردەوەکان کە لەو بارودۆخەوە دێنـە دی، وەکـوو بـەری ئەو دارەن.

بەم پێیە سەرجەمی باوەڕ دوو شتە: دیدارو کردە. کردەوە بەبێ پـشوودرێژی پێـک نایـێ کەواتـە پشوودرێژی نیـوەی بڕوایـە. پـشوو درێـژی دوو چەشـنە: پـشوودرێژی لـە ئارەزووەکـانی نـەفس و ئەویتریان لەسەرخۆ بوون لە هەمبەر تووڕەیی. گـەر لـە ڕەهەنـدێکیتـرەو سـەیری کـەی، بـاوەڕ لـە کردەوەدا دەزانی. کردەی باوەڕدار لە تەنگ و چەڵەمەدا، پشوودرێژییەو لـە خۆشـیدا شـوکرانەبژێری. لەم بارەشەوە، پشوودرێژی نیوەی باوەڕەو شوکرانەبژێری ئەو نیوەیتر، هەر بەو چەشنەی لە خەبـەردا هاتووە. کە سـەیری دژوارتـرو ئەسـتەمتریان کـەی و ئـەوەیان بکەیتـە بناغـەی بـاوەڕ، هـیچ شـت ئەسـتەمترو دژوارتـر لـە پـشوودرێژی نییـە، لـەم ڕووەوە پـشوودرێژی، هـەمووی بـاوەڕە. هـەروەک پرسیاریان کرد: «باوەڕ چییە؟» فەرمووی: «پشوو درێژی»؛ واتە دژوارتـرین بەشـی بڕوایـە. هـەروەک فەرمووی: «حەج، عەرەفەیە»، واتە: گەورەیی پاداشی حەج، لـە سـۆنگەی عەرەفەوەیـە؛ چونکـە بـە فەوتانی عەرەفە، حەجیش بەتاڵە، کەچی ئەو بەشەکانیتر پووچەڵی ناکەونەوە.

## شرۆڤەی نیاز بە پشوودرێژی لە هەموو کاتدا

بزانە، مرۆڤ هەموو کات هۆگری شتێکە کە یان بە پێچەوانەی ئارەزووی ویە یاخۆ هاوڕێیە لـەگـەڵ

---

[1] - علم، حال، عمل.

ئارەزووەکانی و لەهەر دووی ئەم دۆخانەشدا پێویستی بە پشوودرێژی هەیە.

**ئەو شتانەی کە هاودەنگی هەوای نەفسن:** وەکوو ماڵوسامان و پلەو پاگەو تەندروستی و ژن و منداڵی لەبار و شیاو و شتی لەم چەمکە و پشوودرێژی لەمەدا کە خۆڕابگرێ و لە خۆشی و کەیفی دونیا قووڵ نەبێتەوە و هەوساری نەفسی شل نەکا و دڵ نەکاتە گراوی ئارەزووەکانی، لە هەموو شتێک دژوارترە. چونکە گوتوویانە هەموو کەس لە چەرمەسەریدا. پشوودرێژی دەکا، کەچی بێجگە لە راسبێژان کەس لە خۆشی و کەیفدا پشوودرێژ نییە. لە سەردەمی یارانی پێغەمبەردا، کاتێ ماڵوسامانیان پتر بوو، گوتیان: «لەو دەمەیدا کە ژینمان ئەستەم بوو، چاتر دەمانتوانی پشوودرێژ بین تا ئێستا». بۆیە خودا گوتی: أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ[1]. بە کورتی، پشوودرێژی لە کاتی دەسڕۆیندا زۆر دژوارە.

پشوو درێژی لە کاتی دەسڕۆینیدا ئەوەیە کە دڵی پێ نەدەی و پێی شاگەشکە نەبی و بزانی ئەمانەتێکە پێتدراوەو لێت دەسێننەوە؛ تەنانەت دەبێ بە چاوی بەخت و هات سەیری نەکرێ، چونکە رەنگە ببێتە هۆی کەڵوکوتەر بوونی ئاستی بەندە لە پەسلاندا. کەواتە دەبێ بپەرژێتە سەر شوکرانەبژێری ئەو شتانەی لە ماڵ و تەندروستی و هەرچی خودا پێی داوەو بۆ ئەو شتانەش، هەریەکیان بۆ خۆی پێویستی بە شوکرانەیە.

**بەڵام ئەو شتانەی بە ئاوەژووی ویستی نەفسن.** ئەمەش سێ جۆرە: یەکەم ئەوەی کە بە ویستی خۆیە، وەکو پەرستن و پاشگەزبوونەوە لە گوناح؛ ئەویتر ئەوشتەیە بە ویستی خۆی نییە، وەکی مێمل و کارەسات؛ سێیەم ئەوشتەی کە لە راستیدا بە ویستی خۆی نییە، بەلام بەرگری و قەرەبووکردنەوەی بە ویستی خۆیە، وەکوو رەنجاندنی خەڵکی.

بەلام ئەو شتانەی بە ویستی خۆیە، وەکوو پەرستن و بەندەگی خودا: ئەمە پێویستی بە پشوودرێژییە. چونکە هەندێ عیبادەتی وەکوو نوێژ لە سۆنگەی سستی وتەنبەڵییەوە دژوار دیارن؛ هەندێکیان لە سۆنگەی رژدییەوە، وەکوو زەکات؛ برێکیشیان بە بۆنەی هەر دوو هۆوە، وەکوو حەج. هەموو پەرستنێ پێویستی بە پشوودرێژییەو بەبێ لەسەرخۆیی هیچ عیبادەتێ سەرناگرێ، هەم لە سەرەتاو هەم لە ناوەندی عیبادەتداو هەمیش لە کۆتاییدا. سەرەتا دەبێ بە دلبێشی دڵ تەیار کاو لە مەرایی پاکژی کا؛ ئەمەش پشوودرێژییەکی زۆر گرانە. هەروەها لە نێواندا دەبێ لەسەر مەرج و نەریتەکانی پەرستن پشوودرێژ بێ و بە تەکووزی جێبەجێی کا؛ بۆ وێنە گەر لە نوێژدا بوو بەر بە

---

1- (قورئان، ٢٨/٨) بە ڕاستی کە ماڵ و سامانتان هۆی ئەزموونتانن.

هیچ لایێ نەکاتەوە و هیچ لە دونیـا بـیر نەکاتـەوە. پـاش پەرسـتن دەبـێ لـەسـەر ئاشـکرانەکردن و نەگوتن و لووتبەرزی پێ نەکردنی پشوودرێژ بێ.

**بەلام گوناحەکان:** بێ گومان، واز لە گوناحهێنان بێجگە بە پشوودرێژی بە هیچی دی سـەرناگرێ و هەرچەن ئارەزووی گوناح بەهێزتر بێ، گونـاحکـردن سـاناترە. بـەم بۆنـەوە خـۆڕاگرتن لـە هەمبـەر گوناحی زمان ئەستەمترە، چونکە گەڕاندنی ئاسانترە. کە زمان بە زۆری بگەڕێ و زۆر بلێ، خووی پـێ دەگرێ و ئەو خووە دەبێتە سروشتی. یەک لە لەشکرەکانی شەیتان خووکردنە. بەم بۆنـەوە زمـان لـە خوسپەو درۆ و پەسن و بەخۆ هەلگوتندا زۆر ڕەوان و بێگرێ و گۆلە. بە کورتی، چونکـە زمـان هـۆی پێوەندی دەگەل خەلکە و خەلکی سەریان لـێ سـوور دەمێنـێ و پەسـندی دەکـەن، خـۆڕاگری لـە بەرانبەری زۆر دژوارە؛ بـە چەشـنێ کـە تـا پێوەنـدی لـەگـەل خەلـک بـێ، بـەرگری لـێ نـاکرێ و بەرپێگرتنی تەنیا بە دوورەپەرێزی دەلوێ و بەس.

**جۆری دووەم** ئەوەیە کە بێویستی خۆیە، وەکی ئەوەی خەلک بە دەست یا زمان بیرەنجێنن، بەلام لە تۆلە ئەستاندندا دەسەلاتی هەیە. پشوودرێژییەکی زۆری دەوێ تاکوو تۆلە نەسێنێتەوە یا گەر سەندی لە رادەی خۆی تێنەپەڕێ. یەک لە یارانی پێغەمبەر دەلێ: «ئێمە باوەڕ بە باوەڕ نازانین تا ئەوەی کە لە هەمبەر ئازاری خەلکدا پشوودرێژی نەبێ». بەم بۆنەوە بوو کە پەروەردگار بە پێغەمبەری فەرموو پشوودرێژ بە لە هەمبەر رەنج و ئازاری خەلکی و پشتت بە من ببەستە: وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ[1]. گوتی: لە بەرانبەر ئاخاوتنیان پشوو درێژ بەو ئاکاریشت لەگەلیان جوان بێ: وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا[2]. هەروەها گوتی: دەزانم لە پەیڤی دوژمنانت دلت دێشێ، بەلام خەریکی بیر و ویری خودا بە: وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ، فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ[3]. جارێک پێغەمبەر مالێکی دابەش دەکرد، یەکێک گوتی: «ئەمە بۆ خودا نییە». واتە دادوەرانە بەش نەکراوە. ئەم هەوالەیان گەیاندە پێغەمبەر، لەبەر تووڕەیی سوور هەلگەڕا، پاشان گوتی: «پەروەردگار مووسای برام بە رەحمەت کا، چونکە زۆرتر لەمە ئازاریان دەداو ئەو خۆی رادەگرت». هەروەها فەرمووی: «پەروەردگار دەلێ کە ئازاردران و ویستتان تۆلە کەنەوە، بە قەدەر ئەو ئازارە تۆلە کەنەوە، گەریش لێی بوردن، ئەوە چاترە: وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ

---

١- قورئان ٤٨/٣٣.

٢ - قورئان ١٠/٧٣.

٣ - قورئان ٩٧/١٥ و ٩٨.

وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ[1]. لە ئینجیلدا دیم نووسراوە کە: «تاقمێ کە بەرلە من هاتن گوتیان: "دەست لە بەرانبەر دەست، چاو لە بەرانبەر چاو و ددان لە هەمبەر ددان ببەن"، من ئەوە بە بەتاڵ نازانم، بەڵام لەمنەوە قەوینتی بێ بۆتان خراپە بە خراپە پەرسڤ مەدەنەوە، تەنانەت گەر یەکێک زللەی لە لای راستتدا، لای چەپیشتی بۆ بگرە، گەر سەروێنی لێت سەند، کراسەکەشتی پێ بدە، گەر بە زۆر میلێک بردتی، دوو میل لە گەڵی برۆ». پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس بێبەشی کردی، تۆ دیاری پێ بدەو هەرکەس دەگەڵت خراپەی کرد، تۆ بە چاکە وەرامی بدەرەوە». ئەم پشوودرێژییە، پاگەی راستبێژانە.

**جۆری سێهەم**، کە سەرەتاو ئەنجامی بە ویستی تۆ نییە، کارەساتە؛ وەکوو مردنی زارۆک، فەوتانی ماڵوسامان، لە دەس‌دانی ئەندامانی وەک چاو و گوێ و دەست و سەرجەمی مێملە ئاسمانیەکان؛ هیچ پشوودرێژییەک بە قەدەر ئەمە پاداشی نییە.

ئیبنی عەبباس دەڵێ: «پشوودرێژی لە قورئاندا سێ ئاستی هەیە: خۆڕاگری لەسەر پەرستن سێسەد پلەیەکە پاداشت پتر دەکا؛ خۆڕاگری لە هەمبەر شتی حەرام شەشسەد پلەو پشوودرێژی وخۆڕاگری لە بەڵاو مێملدا نۆسەد پلەت دەباتە سەر». پشوو درێژی لەسەر بەڵا، دانستەی راسبێژانە. بەم بۆنەوە پێغەمبەر لە کاتی سکاڵادا فەرمووی: «پەروەرندەم! بڕوایەکی وامان پێ بدە کە مێملەکانی دونیامان لە بەرانبەر ئاسان کاتەوە». پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم دەڵێ: "هەر بەندەیەک کە بەڵامان بۆ نارد، خۆی راگرت و گلەو گازندەی نەکرد، کە تەندروستیم پێ دا، گۆشت و پێستێکی چاتری پێ دەدەم، گەریش گێرامەوە بۆ لای خۆم، بەزەیی خۆمی بە سەردا دەبارێنم"». داوود گوتی: «پەروەرندەم! پاداشی ئەوەی لە بەڵا و کارەساتدا بە بۆنەی تۆوە خۆی رادەگرێ و بە کاوەخۆیە، چییە؟» فەرمووی: «ئەوەیە کە خەڵاتی بڕوای دەکەمە بەرو چجار لێی ناسێنمەوە». دیسان گوتی پەروەردگار دەڵێ: ئەوەی بەڵایەکم نارده سەر خۆی یان منداڵی، یاخۆ ماڵوسامانی، کەچی ئەو بە پشوودرێژییەکی بەدەو دەروستی هات، لە ڕووم نایە دەگەڵی حسێب کەم و بیدەم لە سەنگ و پێوانە». پێغەمبەر فەرمووی: «بە پشوودرێژی چاوەڕوانی کرانەوەی دەروویەکبوون، عیبادەتە». دیسان فەرمووی: «ئەوەی تووشی مێملێک هات، با بڵێت : "انا للّه وَ انّا الیه راجعون، اَللَّهُمَ اَجرنی فی مُصیبَتی وَ اَعقَبنی خَیرا منها"[2] پەروەردگار پەرسڤی ئەم سکاڵای دەداتەوە». دیسان گوتی: «پەروەردگار گوتی: "دەزانی پاداشی ئەوەی بینایی چاوی لێ دەستێنم، چییە؟ ئەوەیە کە دیداری

---

١- قورئان، ١٢٦/١٦.

٢ - ئێمە لە خوداین و بۆ لای وی دەگەڕێنەوە، پەروەرندەم! لەم کارەساتەدا پاداشم بدەرەوەو لەمە چاکترم پا بدەرەوە.

خۆمی پێ خەڵات دەکەم"». یەکێک لە گەورەکان لەسەر کاغەزێک ئەم رستەی نووسیبوو: «واصبر لحكم ربك فانك باعيننا[1]؛ هەرگا تووشی ئازارێ دەبوو، ئەم کاغەزەی لە باخەڵی دەردێنا و سەیری دەکرد». ژنی فەتحی مووسڵی کەوت و نینۆکی شکا؛ پێدەکەنی. گوتیان «ئێشت نییە؟» گوتی: «ئەوەندە بە پاداشی شاگەشکە بووم، ئێشەکەمم لە بیر نەما». پێغەمبەر فەرمووی: «لە راگرتنی رێزی پەروەردگار، یەکیان ئەوەیە کە نەخۆش کەوتی، گلەو گازە نەکەی و کارەساتت بشاریتەوە». یەکێک دەڵێ: «سالم سەرۆکی بووحوزەیفەم بینی لە شەڕدا برینداد داکەوتووە. گوتم: ئاو دەخۆیتەوە؟ گوتی: "پام راکێشە تا لە دوژمن نزیکتر بمەوەو ئاوەکە بکەرەوە نێو گۆزەکەت، چونکە بەرۆژووم. ئەگەر تا شەو زیندوو مام دەیخۆمەوە"».

گریان، یاخۆ بە دڵ خەمخواردن، هێژایی پشوودرێژی نافەوتێنێ، بەڵکوو بەوە بە خەسار دەڕوا کە بانگ هەڵبڕێ و پیسیری دادڕێ و خەڵکی تێبگەێنێ و گازەی زۆر بکا؛ چونکە پێغەمبەر کاتێ ئیبراهیمی کوڕی مرد، بۆی گریا، گوتیان: «مەگەر لەمە بەرگریت نەکردووە؟» فەرمووی: «نە، چونکە ئەمە بەزەییەو پەروەردگار بەزەیی بە کەسێکدا دێ کە دڵی تەژی لە خۆشەویستی بێ». دەڵێ پشوودرێژبوونی جوان، ئەوەیە کە کارەسات لێداو بەهۆی شیوەن و گریانەوە لە کەسانیتر جیا نەکرێتەوە، چونکە هەموو ئەوانە ناڕەوان؛ تەنانەت بارودۆخی خۆگۆڕانن و سەروێن لەسەر دانان و سەروێنی کورت بەستنیش ناڕەوایە؛ دەبێ بزانی کە پەروەردگار، بەبێ تۆ بەندەیەکی ئافراندو بەبێ تۆش بردیەوە لای خۆ. رومەیسای دایکی سەلیم ژنی ئەبووتەلحە گوتی: میردەکەم لە ماڵ نەبوو، کوڕەکەم بە ئەمری خوا چوو. دامپۆشی و لە سووچێ دامنا. کە مێردەکەم گەڕایەوە گوتی: نەوشەکەمان چۆنە؟ گوتم: هیچ شەو چاتر لە ئەمشەو نەبووە. خواردنم بۆ دانا تا تێری خوارد و خۆم بەدموتر لە شەوانیتر بۆ رازاندەوە تا نیازی پێکهێنا و خۆمان شوشت؛ پاشان گوتم: بە ئەمانەت شتێکم لە لای دراوسێکەمان دانا، کە داوام لێکرد، دەگریاو بانگی هەڵداو دڵتەنگی دەکرد. مێردەکەم گوتی: زۆرسەیرە، چ هاوسێیەکی کەم فامە. پاشان گوتم: ئەم کوڕەمان ئەمانەتێ بوو لە پەروەردگار، داوای کرد و بردیەوە. گوتی: انا للّٰهِ وَ انا الَيه راجعُونَ». شەوەکی بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە. فەرمووی: «پەروەردگار دوێشەوتان لێ پیرۆزکا، چ شەوێکی گەورە بووە». پاشان پێغەمبەر گوتی: «شەوی میعراج رۆیشتمە نێو بەهەشت، رومەیسای ژنی بووتەڵحەم لەوێ بینی».

بەمەی بێژرا تێگەیشتی کە مرۆڤ لە هیچ دۆخێکدا لە پشوودرێژی بێ نیاز نییە؛ تەنانەت گەر لە هەموو ئارەزووەکانی دەرباز بێ و دوورەپەرێزی بگرێ و چش لە دونیا کا، لە تەنیاییشدا هەزاران

---

[1] - بە فەرموودەی پەروەرندەت پشوو درێژ بە، تۆ لە پێش چاوی ئێمەی.

وازوازی و بیر و خەیاڵی جۆربەجۆر لە ناخیدا چرۆ دەکەن و لە یادی خودای دوور دەکەنەوە. گەر ئەو بیرەی بە مێشکیدا تێدەپەڕی، ڕەوا بوو، چونکە کاتی بە خەسار دەدا و تەمەن کە گرینگترین سەرمایەیە بۆی، بەفیڕۆی دەدا، زیانێکی مەزنی کردووە؛ ڕێگەچارەی ئەوەیە کە خۆی بپەرژێنێتە سەر یادی خودا. گەر لە نوێژیشدا وازوازی بۆ هاتە گۆڕێ، دەبێ پتر کۆشەوە کاو لەوەش ناخەڵسێ مەگین ئەوەی کە بپەرژێتە سەرکارێ کە دڵ و بیری پێی خجڵ بێ. لە خەبەردا هاتووە کە: پەروەردگار گەنجی بێکار بە دوژمنی خۆی دەزانێ». هۆکەی ئەوەیە کە لاوێک کە بێکار بێ، دنەی شەیتان دەبێتە هامڕازی و دڵی دەبێتە هێلانەی وازوازی و تەنیا بە یادی خودا دەتوانێ خۆی لێ ڕزگار کا؛ بۆیە دەبێ پیشەیەک بۆ خۆی هەڵبژێرێ، یان خەریکی کارو خزمەتگوزاریەک بێ. ئەم کەسە نابێ بە تاقی تەنێ دابنیشێ، بەڵکوو هەرگا لە کاری دڵ، ماندوو بوو، دەبێ خەریکی کاری لەش بێ.

## شرۆڤەی دەرمانی پشوودرێژی

بزانە، دەرگاکانی پشوودرێژی زۆرن، پشوودرێژی لەسەر هەریەکیان شتێکی‌ترەو دەرمانەکەشی جۆرێکی‌ترە، هەرچەند دەرمانی هەموویان، ماجوونێکە لە زانست و کردەوە. هەرچی لە بەشی کوشندەکان (مهلکات) بێژرا، هەموویان دەرمانی پشوودرێژین؛ لێرەشدا بۆ نموونە یەکێکیان دەڵێین تا خەڵکی بە پێوانە ئاست و ڕادەی بزانن.

پێشتر گوتمان، پشوو درێژی، خۆڕاگری بزوێنەری دینییە لە هەمبەر بزوێنەری شاوەت. ئەمەش جۆرێک لە بەربەرەکانێیە لە نێوان ئەم دوو بزوێنەرەدا، هەرکەس دووکەس بە گژ یەکدا دەداو هەڵیان‌دەورووژنێ و دەیەوێ کە یەکێکیان سەرکەوێ، ڕاوێژ بۆ دەرمانی ئەوەیە کە ئەو یەکەیان وا دەیەوێ سەرکەوێ، یارمەتی بدا تا بەهێزتر بێ و ئەویتریان خوست لێ ببڕێ و هازی کەم کاو لە یارمەتی بێوەری کا. وەکوو ئەوەی گەر کەسێک ئارەزووی ژنان بە سەریدا زاڵ بێ و خۆی پێ ناگیرێ و ناتوانێ هێمن و بەکاوەخۆ بێ و هەرچەند دەیەوێ، بەلام ناتوانێ چاو لە ڕوانین و دڵ لەبیرکردن رابگرێ و پشوودرێژ بێ، ڕاوێژ ئەوەیە کە سەرەتا بزوێنەری شاوەت لاواز بکا؛ ئەمەش بە سێ جۆر پێک‌دێ: **یەکەم** ئەوەی کە دەبێ بزانین هێزی شاوەت، بە خواردن دابین دەبێ. کەواتە ئەم یارییەی لێ درێخ دەکەن و بە ڕۆژووی ڕادەگرین، بە چەشنێ کە شەوان نانی خاڵی پێ دەدەین و تا بکرێ کەمی پێ دەدەین و گۆشت وخواردنی خۆشی لێ دادەبڕین. **ئەویتریان** بڕینەوەی ڕێی تامازرۆییە لە ئارەزووی نەفس. ئەم تامازرۆییەش بە نەڕوانین بۆ ڕوومەتی جوان و شووشەیی ڕێگای پێ دەبڕێ. دەبێ خۆی دوورەپەرێز کاو چاوی داخاو لەسەر ڕێگای بواری ژنان و مندالان

رانەوەستێ.

**سێهەم** بە حەلاڵ هێوری کاتەوەو شاوەتی حەرام لە خۆی بڕەوێنێ و ژن بێنێ، چونکە شاوەت بەژنهێنان دادەمرکێ. راستییەکەی ئەوەیە کە بەبێ هاوسەر هەڵبژاردن لە دنەی شاوەت دەربازی نایە. ئەمە وەکوو چارەوایەکی سەربزیوە کە سەرەتا خواردنی لێ دەگرینەوە، تا کەوی بێ، پاشان ئالفی لە پێش چاو هەڵدەگرین تا نەیبینێ؛ ئینجا ئەوەندەی کە پێی ئۆقرە بگرێ، دەخەینە بەری. ئەم سێ دەرمانە بۆ شاوەتیش دەبن. ئەمە لاوازکردنی بزوێنەری شاوەتە.

بەڵام بەهێزکردنی بزوێنەری دینی بە دووجۆرە: **یەکەم** ئەوەی کە سەرەتا قازانجی بەرەنگاری لەگەڵ شاوەتی بۆ روون کەینەوەو ئەو خەبەرانەی لەسەر ئەم بابەتە گێردراونەتەوە، بۆی بگێڕینەوەو پاپای ئەم بەرەنگارییەی لەدڵ بچێنین؛ چونکە گەر ئەم باوەڕەی کە قازانجی شاوەت ماوەیەکی زۆر کورتەو چێژی پشوودرێژی و خۆڕاگرتن لە بەرانبەر دنەی شاوەت، گەیشتن بە پادشایی هەتاهەتایە، پتەو بکرێتەوە، بزوێنەری دینیش هازی پێ دەگرێ. دووەم ئەوەیە کە کەم کەم و بەرەبەرە خووی بدەین بە دژایەتی دەگەڵ شاوەت، تا بەهێز بێ و بە سەریدا زاڵ بێ. چونکە ئەوەی بیەوێ بەهێزو بەشان و باهۆ بێ و کاری قورس و گران بکا، دەبێ بەرەبەرەو هێواش هێواش خۆی بەهێز کاتەوە؛ ئەوەی تەمای زۆران لەگەڵ پاڵەوانێکی بەشان و پیلی هەیە، دەبێ سەرەتا لەگەڵ زۆرانبازانی کەم هێز زۆران بگرێ، تا بەرەبەرە زۆردار بێتەوەو بتوانێ پشتی ئەو پاڵەوانە بە خاکدا بنووسێنێ. لەم سۆنگەوە ئەوانەی کاری دژوار دەکەن، بەهێزترن. دەرمانی بەربەرەکانێ دەگەڵ شاوەت، خۆڕاگری و پشوودرێژی لەم کارانەیە.

## شرۆڤەی راستەقینە و هێژایی شوکرانە بژێری

بزانە شوکرانەبژێری پلەیەکی گەورەو ئاستێکی بەرزەو هەرکەس لە راستەقینەی ناگا؛ لەم سۆنگەوە پەروەردگار فەرمووی: وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ[1]. ئیبلیس تیزی لە مرۆ دەگرت و دەیگوت: وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ[2]؛ زۆربەی ئەوانە شوکرانە بژێرنین.

بزانە ئەو دانستانەی کە رزگارکەرمان ناو لێنان، دووپاژن: یەکیان لە دەسپێکەکانی رێی دینەو لە خۆیدا مەبەست نییە، وەکوو تەوبەو پشوودرێژی و ترس و پارێزگاری و چاودێری بە سەرخۆدا، هەموو ئەمانە ئامرازو هۆکاری کارێکی‌ترن کە هی رێ نیە. ئەو پاژی‌تر دۆزو مەبەست و مەنزڵگایە کە لە خۆدا ئارمانجن، نەک ئەوەی هۆی گەیشتن بە دۆزێک بن؛ وەکوو خۆشەویستی و تامازرۆیی بۆ

١ - (قورئان ١٣/٣٤) لە عەبدەکانم کەمتریان شوکری دەکەن. (هـ)

٢- قورئان، ١٧/٧.

دیتنی خودا و ڕازیبوون بە ویستی خودا و تاکپەرستی و پشتبەستن بە خوا؛ شوکرانەبژێری لەم ریزەیە و هەرچی وابێ لە پەسلاندا دەمێنێتەوە. هەروەک گوتی: وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ[1]. کەواتە، چونکە زۆر پێویستە لە کۆتایی ئەم کتێبەدا بە وردی باس دەکرێ، بەلام چونکە شۆکرانەبژێری بە پشوو درێژییەوە بەندیوارە، لێرەدا هێنامان.

نیشانەی گەورەیی ئەمە ئەوەیە کە بینایی چاوان لەگەل یادو بیری خۆی هاوشانی داناوەو فەرمویە: فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ[2]. پێغەمبەر فەرمووی: «پلەو پاگەی ئەو کەسەی خواردن دەخواو شوکرانەبژێری دەکا، وەکی ئەو کەسەیە کە ڕۆژوو دەگرێ و بەکاوەخۆیە». دیسان گوتی: «ڕۆژی پەسلان گاس دەکەن "لەکوێن شوکرانەبژێران؟" کەس ڕانابێ، مەگین ئەو کەسەی لە هەموو دۆخێکدا سوپاسی خوای کردبێ». کە ئەو ئایەتەی لۆمەی کۆوەکەرانی مال دەکا، هاتە خوارێ، عومەر گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! کەواتە چ شتێ کۆوە کەین؟» فەرمووی: «زمانی زیکربێژ، لەشێکی پشوودرێژ، دلی شوکرانەبێژ و ئافرەتێکی بڕوادار»؛ واتە لە مالی دونیا هەر بەوەی کە ئافرەتێکی بڕوادارت بێ چاوتێر بە، چونکە هەلی زیکرو شوکرو پشوودرێژیت بۆ دەڕەخسێنێ. ئیبنی مەسعوود دەلێ: «شوکرانە بژێری پاژێک لە بڕوایە». عەتا دەلێ: لە لای عایشە بووم، گوتم لە ئەحوال و دۆخەکانی پێغەمبەر شتێکم بۆ بگێڕەوە. گوتی: «لە حالی پێغەمبەر چ شتێ هەیە کە سەیر نەبێ، شەوێک هاتە لام و لەژێر نوێنەکەمدا ڕاکشاو لەشم دای لە لەشی رووتی؛ پاشان گوتی: "ئەی عایشە! بێلا بڕۆم و بەندەگی خودا بە جێ بێنم". گوتم: "من پێم خۆشە لێت نزیک بم، بەلام بڕۆ؛ ڕابوو، لە مەشکەی ئاو، ئاوی داکرد و دسنوێژی شۆردو بۆ نوێژ خوێندن ڕاوەستاو بە کول دەگریاو دەگریا، تا ئەوەی کە بیلال هات بۆ بانگی بەیانی. گوتم:"پەروەردگار سەرلەبەری گوناحەکانی تۆی بەخشیوە، بۆچی وادەگری؟" گوتی: "کەواتە بەندەیەکی پێزان نیم، دەی چۆن نەگریم؟ کەچی ئەم ئایەتەم بۆ هاتە خوارێ: إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ، ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ[3]"»؛ واتە: ژیران و خاوەن هزران بە پالەوە و بە دانشتنەوەو بە پاوە خەریکی سوپاسی خودان و سەیرو سەیری سەمەرەکانی مەلەکووت و زەوی

---

١ - (قورئان، ١٠/١٠) دوامین نزایان هەرئەمەس: سپاس بۆ خوای ڕاهێنەری گش دنیایە. (هـ)

٢ - (قورئان، ١٥٢/٢ ) سائێوە یادی من بکەن، تامنیش لە بیرتان نەکەم. هەرشوکرانەی من بێژن و لە چاکەی من حاشا مەکەن. (هـ)

٣ - (قورئان ١٩٠/٣ – ١٩١) لە ئافراندنی ئاسمانان و لەزەویدا و ئالوگۆری شەووڕۆژان، زۆر نیشانەی پتەو هەیە بۆ ئەوانەی کە خێوی دلی وشیارن؛ ئەوانەی چ بە وێستاوی و چ لە جێوە بە دانیشن چ بەڕاکشاوی هەریاری خودا دەکەن.

دەکەن، لە شوکرانەی ئەوەی کە بەم ئاستە گەیشتوون دەگرین، لـە شـادیوە وا ئەسـرین دادەبـارێنن، نەک بەهۆی ترسەوە. دەگێڕنەوە کە «یەکێک لە پێغەمبەران لە شوێنێکدا تێدەپـەڕا، بـەردێکی وردی بینی کە ئاوێکی بە خوڕی لێ دەچوو. بە ئیزنی خودا هاتە قسە وگوتی: "لەو دەمەیـڕا خـودا گوتوویـە وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجارَةُ -واتە بەردو خەڵـکی دەبنـە دەسـتەچیلەی ئـاوری دۆژەمـن هـەروا دەگـریم." گوتی: "خوایا! لەم مەترسییەی هێمن کەوە!" پەرسڤی دوعاکەی درایەوە. ماوەیـەکی‌تـر هـەر لەوێـدا تێدەپەڕی، ئەو بەردە هەروا دەگریا، گوتی:"ئێستا بۆ دەگری؟" گوتی: "گریـانی پێـشووم لەبـەر تـرس بوو، ئەمجارەیان لەبەر شوکرانەبژێریە کە دەگریم"». ئەمە نموونەیەکـە بـۆ دڵـی مـرۆڤ کـە لـە بـەرد ڕەقترە؛ دەبێ جارێ لەبەر ترس و جارێ لەبەر شادی ئەوەندە بگری تا نەرم دەبێ.

## ڕاستەقینەی شوکرانەبژێری

هەروەک پێشتر هاتە گوتن، هەموو مەقامەکانی دین لە سۆنگەی سێ بنـەماوە دێنـە دی: زانـست وحاڵ و کردەوە. زانست، بنەمایەو حاڵی لێ دێتە دی و لە حاڵـیش کـردەوە چـێ دەبـێ. هـەروەهـا زانستی شوکرانەبژێری، ناسینی نیعمەت لە خودایەو حاڵ، شادی دڵە بـەو نیعمەتـەو کـردەوەش، بـە کارهێنانی ئەو نیعمەتەیە لەو ڕێگەی کە مەبەستی خودایە. ئەو کردەوە هەم بە دڵ و هەم بـە زمـان و هەمیش بەلەش بەندیوارە؛ تاسەرلەبەری خویان نەبێ، ڕاستەقینەی ئاشکرا نابێ.

**زانست** ئەوەیە کە بزانی هەر بەشێ کە پێت دراوە، لە پەروەردگارە و کەس لـەوەدا ئامبـازی نییـە. هەتا لە نێو هۆکارەکاندا کەسێک ببینی و بە سەر ئەو شتەی کە پێت دراوە، بەکاریگـەری بـزانی، ئـەم زانستی شوکرانەیە تەواو نییە. وەکوو ئەوەی کـە پادشـایەک خـەلاتـت کـا و پێـت وابـێ بـە بۆنـەی سەرنجی وەزیرەوە پێت دراوە، ئەو شوکرانەبژێرییەت بەتەواوی بۆ خونکار نییـە و بـرێکی بـۆ وەزیـرە. بەڵام گەر بزانی کە دیارییەکە بە ئیمزاوە پێت دراوەو ئیمزاش بە قەڵـەم و کاغـەزە، لەمـەدا هـیچ کـە مایەسی‌یەک نییە؛ واتە وابیر ناکەیتەوە کە ئەو قەڵەم و کاغەزە کاریگەرییەکیان بە سەر پادشـادا بـووە بۆ ئەوەی کە خەلاتی کردووی؛ چونکە دڵنیای کە قەڵەم و کاغەز لە ژێر ڕکێفی نووسەرایەو بـۆ خـۆی هیچ دەسەڵاتێکی نییە؛ تەنانەت گەر بزانی کە خەزانەدار پێتی گەیاندووە، دیسان هـیچ زیـانی نییـە، چونکە دەزانی کە خەزانەداریش هیچ دەسـەڵاتێکی نییـەو بـۆ خـۆی لـە ژێـر دەسـەڵاتی پادشـایەو ناتوانێ بە ئاوەژووی ویستی پادشا بجوێتەوەو گەر پادشا ئیـزنی نەدایـە، نـەیـدەتـوانی بـۆتی بێنـێ، ئەویش وەک پێنووس لە ژێر ڕکێفی خونکارایە. هەروەها گەر نیعمەتی سـەرزەوی لـە بـاران بـزانی و بارانیش لە هەور، هەروەها ڕزگاربوونی گەمیە لە تـۆف و بـاران بـە بۆنـەی بـای ڕاسـتەوە بـزانی، ئـەو شوکرانەبژێرییە تەواو نییە! بەڵام کە زانیت هەور و باران و با و هەتاو مانگ و ئەسـتێران، وەکـوو چـۆن

پێنووس لە ژێر ڕکێفی نووسەرایە، ئەوانیش لە ژێر دەسەڵاتی پەروەردگارن و تا ئەو دەستووریان پێ نەدا، هیچیان قەد نابزوونەوە، ئەمە هیچ نوقسانێک لـە شـوکرانەبژێریدا ناهێنێتـە دی. گـەر کەسـێک خێرێکت بداتێ و تۆ ئەو خێرە لەو کەسەوە بزانی، ئەم بۆچوونەت کۆسپ و لەمپەرێکە لـە سـەرمەقامی شوکرانەبژێریت. بەڵکوو دەبێ بـزانی ئـەو خێـرەی بۆیـە پیـت دا چونکـە پـەروەردگار دنـەدەرێکی ناردەسەری تا هانی بدات و بتداتێ، هەرچەند ویستی پێونەدا، پێی نەکرا، لە راسـتیدا گـەر بیتوانیایـە لێتی دریغ کا، قەد تۆزکاڵێکی پێت نەدەدا. ئەو دنـەدەرەش، ئـەو پاپایەیـە کـە کەوتـە دڵـی تـا ئـەو چاکەت دەگەڵ کاو لە بەرانبەریدا خێری دونیاو پەسلانی بەرکەوێ، ئەویش بە تـەمای گەیـشتن بـە ئاواتی دونیایی یان باخ و باخاتی ئەو جیهان، ئەوەی پێتدا. لە راسـتیدا ئـەو چاکـەی دەگـەڵ خـۆی کرد، تا بگات بە دۆزو ئارمانجی؛ بەڵام پەروەردگار بە تـۆی داو ئـەوی کـردە بریکـار. پـەروەردگار لـە بەرانبەر ئەو چاکەیدا هیچ مەبەستێکی نییە. کـەوابوو، گـەر راسـتەقینە بیناسـی و بـزانی کـە مـرۆڤ هەموویان خەزانەداری ماڵوسامانی خودان؛ خەزانەداریش وەکوو پێنووسە، لە دەسـتی هـیچ یـەکیان هیچ دەسەلاتێ نییە، بێجگە ئەوەی دەستووریان پـێ دراوەو ئـەمریان پـێ کـراوە، ئـەو دەم دەتـوانی شوکرانەبژێری ئەم چاکەی پەروەردگـارەت بکـەی؛ لەراسـتیدا ئـەم ناسـینە، خـۆی شـوکرانەبژێرییە. هەربەو چەشنەی کە مووسا لە سکالایدا گـوتی: «بینـایی چـاوان! مرۆڤـت بـە دەسـتی دەسـەڵاتی خۆت ئافراندو واو وات دەگەڵ کرد، شوکرانەبژێری تۆ چۆن بە جێ بێـنم؟» گـوتی: « زانی کـە ئەوانـە هی منن و ئەم زانینەی شوکرانەبژێرییە».

هەروەها دەبێ بزانی کە دەرگای ناسینی باوەڕ زۆن. یەکەمیان ئەوەیە کە بە پـیرۆزو پـاک بزانـرێ، بزانی کە پەروەردگار لە دانستەی نووکـوبەدی ئافرێندراوان و ئەوەی لە بیروخەیاڵدا دەگونجـێ، پـاک و پاراوەو بە «سُبحانَ اللّه» پەسن کراوە.

دووەم ئەوەیە کە بزانی، لەگەڵ ئەم پاکییەش، تاقانەیەو هیچ ئامبـازێکی نییـە و بـە «لاالـهَ الااللّـه» تاریف کراوە. سێهەم ئەوەیە کە بزانی هـەرچی هەیـە هـەمووی هـی ئـەوەو خێـرو چاکـەی خودایـە دەگەڵ ئافرێندراوانی و ئەمەش بە «اَلحَمدُللّه» پەسن دەکـرێ؛ ئەمـەش سـەرتر لـە هـەر دووی‌تـرە، چونکە ئەوان لە دوای ئەمن؛ لەم سۆنگە پێغەمبەر فەرمووی: «سُبحانَ اللّه» دەچاکەیە و لاالـهَ الااللّـه بیست چاکەیە و اَلحَمدُللّه سی چاکە. ئەم چاکانەش گەڕانی زمان نییە لەسـەر ئـەم زاراوانـە، بەڵـکوو ئەمە چاکەی ئەو زانیارانیانەیە کە لە دڵدا چێ دەبێ و ئەم پەیڤانەش بریتین لـەو زانیاریانـە. ئەمـەی بێژرا، واتای شوکرانەبژێری بوو.

بەڵام **دۆخی شوکرانە بژێری** . ئەو شادییەیە کە لـە سـۆنگەی ئـەم زانستەوە لـە دڵـدا دێتـە دی؛ چونکە هەرکەس خێرێک لە کەسێکی‌ترەوە ببینێ، پێی شاد دەبێ. بەڵام ئـەم شـادیە، سـێ ئاسـتی

هەیە:

**یەکەم** کاتێ خونکارێک بۆ سەفەر دەڕواو ئەسپێک دەداتە خزمەتکارێکی خۆی؛ گەر ئەو خزمەتکارە پێی شاد بێ، چونکە نیازی بەو ئەسپە بووە، ئەم شادییە شوکرانەبژێری خونکار نییە؛ چونکە گەر ئەم ئەسپەی لە ساراشدا ببینایەتەوە، دیسان پێی شاگەشکە دەبوو.

**دووەم-** ئەوەیە کە شادبێ بەوەی کە زانیویە خونکار سەرنجی دەداتێ و رەنگە خەلاتی‌تریشی لەم سۆنگەوە بەرکەوێ؛ ئەمە شادبوونە بە خەلاتدەر، بەلام بە بۆنەی خەلاتەکەیەوە، بۆیە هەرچەن پێزانینە، بێزانینێکی ناتەواوە.

**سێیەم-** ئەوەیە کە شادبێ بەو ئەسپە چونکە دەتوانێ سواری بێ و بڕوا بۆ سەردانی پادشا و پتر لەمە چیدی ناوێ. ئەمە شادی بە پادشایەو شوکرانەبژێرییەکی تەواوە.

هەروەها ئەوەی پەروەردگار خەلات و خێرێکی پێ داو ئەو کەسە بەو خێرە شاد بوو، نەک بە خێردەرەکەی، ئەوە شوکرانەبژێری نییە؛ گەر بە خێردەرەکە شادبوو، بۆ ئەوەی کەوتۆتە بەر سەنجی و خەلاتی‌تری دەداتێ، ئەمە شوکرانە بژێرییە، بەلام ناتەواو؛ گەر بەو خەلات و خێرە شاد بوو چونکە هەلی بۆ دەرەخسێ تا واز لە کاری دونیا بێنێ و بپەرژێتە سەر پەرستنی پەروەردگار و کۆوەکردنی زانست و لە پەروەردگار نزیک کەوێتەوە، ئەمە پێزانینێکی تەواوە. نیشانەی ئەمە ئەوەیە کە هەرچی لە دونیا تەگەرە دەخاتە نێو ئەم پێوەندییەی دەگەڵ پەروەردگار، هیچ بە خێری نازانێ، بەڵکوو بە دوژمنی دەزانێ؛ تەنانەت تامازرۆیە ئەو خێرەی لێ بسێننەوەو بە نەبوونی شادوشوکر دەبێ. کەواتە، چچار بەوشتەی ئاریکاری رێی دین نەبێ بۆی، شاد نابێ. لەم سۆنگەوە شبلی گوتی: «شوکرانەبژێری ئەوەیە کە خێر نەبینی، خێردەرببینی». ئەوەی تەنیا چێژ لە بەرهەستەکان ببات، وەکوو چاوو شاوەت و ورگ، شوکرانەبژێری پێ ناکرێ. کەواتە، کەمتر لەوە نییە کە دەڕواتە ئاستی دووەمەوە، چونکە ئاستی یەکەم شوکرانەبژێری نییە.

بەلام **کاری شوکر** بە دڵ و زمانە و لەش:

بە دڵ ئەوەیە کە خێری بۆ سەرجەمی خەڵک بوێ و ئێرەیی بە کەس نەبا.

بە زمان ئەوەیە کە سپاس دەکاو اَلحَمدُلِلّهِی زۆر دەڵێ و لە هەموو دۆخێکدا شادی خۆی بە خەلاتدەر پیشان دەدا. پێغەمبەر لە یەکێکی پرسی: «چۆنی؟» گوتی: «چاکم». دیسان گوتی: «چۆنی؟» ئەمجار گوتی: «چاکم، سپاس بۆ خوا!». فەرمووی: «ئەمەم دەویست». مەبەستی پێشوونان لەوەی کە دەیانپرسی «چۆنی» ئەوە بوو کە لە وەرامدا شوکرانەبژێری بژنەفن. تا هەم بێژەر و هەم بیسەر لە پاداشەکەی بەشدار بن. ئەوەی گازەو گلەیی بکا، گوناحبار دەبێ، هەرچەند

تووشیاری بەلا بێ؛ هەروەها چەن کرێتە کەسێک تیزو تانەو گلەو بناشتی لە خـودانی زەوی و حـەوت ئاسمان بێ بۆ ئەوەی کەم دەسەلاتەو هیچ لە دەستی ویدا نییە. بەڵـکوو دەبـێ کـاتی بـەلاو مێمـل، شوکرانەبژێر بێ، چونکە رەنگە ئەو بەلایە ببێتە هۆی بەختەوەری وی و گەرپێی نـەکرێ، پـشوودرێژ و خۆڕاگربێ.

سپاس کردن بەلەش ئەوەیە کە بزانـێ هـەموو ئەندامـەکـانی خـەلاتی خودایـەو بـەو کـارەی خـۆ خەریک کا کە بـۆی ئافرێنـدراوەو هـۆی ئافراندنیـشی بەنـدەگی خـوداو گەیـشتن بـە بەختـەوەری دوارۆژەو لێتی دەوێ کە بپەرژێتە سەر کاری دوارۆژ. کە خەلاتەکەیت لە ویستی خۆیدا خـەرج کـرد، سپاست کردووە، هەرچەند ئەو هیچ بەهرەو بەشێکی نـاوێ و لـەوە پـاکژە. ئەمـە وەکـوو ئەوەیـە کـە پادشایەک بایەخ بداتە خولامێکی وئەو خولامەش لە خونکار دووربـێ، بۆیـە چارەوایـەک و توێـشووی رێی بۆ دەنێرێ تا بێ بۆ لای و بەم هاتنە و بەم نزیکییە، گەورەیی و شانوشکۆ بەدەس بێنـێ؛ کـەچی پادشا دوور و نزیکی ئەو خولامەی بۆ وەک یەک بێ و نە هاتنی شتێکی لێ زیاد دەکـاو نـە نـەهاتنی شتێکی لێ کەم دەکا، بەلام گاسی دەکاتە لای خۆی تاکوو چاکـەی لەگـەڵ کـا؛ چونکـە دەهنـدەو دلۆڤانە و چاکەی بۆ هەموو خەڵک دەوێ، نـەک خـۆی. گـەر ئـەو خولامـەش سـواری ئەسـپ بـێ و توێشوو هەڵگرێ و بە مەبەستی سەردانی خونکـار هـەورازو نـشێوی رێ بگرێتـە بـەر، سوپاسـی ئـەو خەلاتەی کردووە. هەروەها گەر سوار بـێ و پـشت لـە پادشـا کـاو پتـر لێـی دوور کـەوێ، ناسپاسـی کردووە. هەروەها گەر سواری نەبێ و نە دوور کەوێ ونە نزیک، دیسان ناسپاسـی کـردووە، بـەلام نـە وەکوو ئەوەی دوور کەوتۆتەوە. هەروەها گەر بەندەیەک نیعمەتی خودا بۆ لـێ نزیـکـکـەوتنی بگرێتـە کار، سپاسی کردووەو گەر لە رێی گوناحدا خەرجی کا، کوفری کردووە و گەریش بە بـە تالـی داینـێ، یان بۆ کەیف و سەیران سواری بێ و نە دوور کەوێ و نە نزیک، دیسان کوفری کردووە، هەرچەنـد بـە ئاستی ئەویتر ناگا.

کە لێت خویان بوو پێزانین بە هەر نیعمەتێ ئەوەیە کە بە گوێرەی ویستی خـودانی خـەرج بکـرێ، ئەمەش بە کەس ناکرێ، مەگین ئەوەی ویستی ئەو لەگەڵ ئەوشتانەی پێی خـۆش نییـە، هـەلاوێرێ. ئەمەش هۆزانییەکی وردو ئاستەمەو تا مەبەست لە ئافراندنی هەر تشتێ نـەزانێ، ئەمـەی لـێ خویـان نابێ. لەم کتێبەدا چەن وێنەیەک دەهێنمەوەو ئاماژەی پێ دەکـەم، گـەر کەسـێک راڤـەی زۆرتـری دەوێ، با سەیری کتێبی ئەحیا کا؛ چونکە ئەم کتێبە پتر لەمە هەڵناگرێ.

**شرۆڤەی ئەوەی کە کوفری هەر نیعمەتێ ئەوەیە کە ئەو نیعمەتە بە ئاوەژووی ئەو هۆزانی و بەردەبارییەی کە بۆی تەرخان کراوە خەرج بکرێ**

بزانە خەرج‌کردنی نیعمەتی خودا لەو کارەیدا ویستی خوایە، شوکرانەبژێرییەو بە ئاوەژووی ئەوە کوفری نیعمەتە. ناسین و لێک‌هەڵاواردنی ئەوەش تەنیا بە شەرع دەکرێ و بەس. کەواتە، دەبێ نیعمەت لە ڕێی بەندەگی و پەرستندا خەرج بکرێ، هەر بەو جۆرەی دەستووری لەسەر دراوە. بەڵام ئەوانەی چاوی دڵیان ڕووناک بۆتەوە، شێوازێکیان هەیە کە بە هۆی ئەو شێوازەوە بەردەباری[1] کارەکان بە بیرو بۆچوون و بەڵگە و سەرۆوە[2] دەناسن. هەروەک ڕەنگە کەسێک بزانێ هەور بۆ باران ئافرێندراوەو باران بۆ ڕوەک و ڕوەک بۆ گیاندار؛ هەروەها هەتاو بۆ هاتنی شەو و ڕۆژ ئافرێندراوە، تا لە شەودا هەدا بداو بحەسێتەوە و ڕۆژ بۆ دابین‌کردنی بژێو هەوڵ وتەقالا بدا. ئەمانەی بێژران ئاشکران و هەرکەس دەیانزانێ. بەڵام ڕۆژ هۆی‌تری هەیە بێجگە لەمانەی بێژران، کە هەرکەس نایزانێ؛ هەروەها ئاسمان تژی لە ئەستێرەیەو هەریەک بۆ مەبەست و هۆیەک چێ کراوەو هەرکەس لە بەردەباری ئافراندنیان نازانێ. هەروەک هەرکەس لە ئەندامانی خۆیدا دەزانێ کە دەست بۆ ڕاگرتن و پێ بۆ ڕاکردن و چاو بۆ دیتنەو نازانێ جەرگ و سپڵ کاریان چییەو بۆچی چاویان لە دە چین ئافراندووە. هەندێ لەم هۆوانە وردن و هەندێ وردترن و بێجگە لە هەندێ کەسی تایبەت، کەسی دی نایانزانێ و لێرەشدا جێگای ڕاڤەیان نابێ.

ئەم ڕادەیە دەبێ بزانرێ کە مرۆڤ بۆ دوارۆژ خولقاوە نەک بۆ دونیا، هەرچیش لە دونیا کراوەتە بەشی مرۆڤ، بۆ ئەوەیە لە ڕێی دوارۆژدا ببێتە توێشووی و زادی ڕێگای ئەو دونیای پێ دابین کا. پێی وانەبێ هەموو شتێکیان بۆ ئەو ئافراندووەو کە قازانجی نەزانی، بلێ: ئەمەیان بۆچی خولقاندووە؟ چ هۆزانییەک لەرسکانیدا بووە؟ بۆ وێنە بلێ: مێش و مێروولە بۆچی ڕسکاوەو ماریان بۆ ئافراندووە؟ دەبێ بزانی مێرووڵەش گەلێک سەری سوور دەمێنێ کە تۆیان بۆچی ئافراندووەو بەخۆڕایی پێ بەسەر سەریدا دەنی و دەیکوژی. کامڵ‌بوونی دەهەندەیی پەروەردگار پێویستی دەکا کە هەرچی بۆی دەلوێ کە ببێ، دەبێ بە جوانترین بیچم بێتە دی، لە هەموو جۆر و چینێک، لە گیاندارو ڕوەک وکان و تشتی وا؛ ئەوسا هەرچی گەرەکی ئەوشتەیە، بە چەشنێ کە شیاوی جوانی و ڕازاوەیی ونیازی ئەو شتەیە، دێنێتە دی، چونکە بۆ ئەو نە کۆسپێک هەیەو نە تەگەرەو ڕژدییەک. هەرچی لە جوانی و تەواوەتیدا لە بووندا نەگونجێ، شوێنەکە شیاوی ئەو بوونە نییە، چونکە شوێنی ژین، بە ئاوەژووی هەل ومەرجی بوونی ئەو شتە لە گەڕایە. ڕەنگە ئەو دژایەتییەش، گەڕانێکی تەبا بێ بۆ

---

١ - بەردەباری: حکمت.

٢ - سەرۆ: الهام

هاتنەدی شتێکی‌تر. وەکوو ئەوەی کە ئاور بۆی بووز ناخوا دەگەڵ ساردی و نەرمی ئاو تەبابێ، چونکە گەرم و سارد پێکڕا کۆوەنابن و دژ بە یەکن؛ چونکە مەبەست لە ئاور تین و گەرمایەو نەمانی ئەو گەرمییە، کەمایەسییە بۆی. لە راستیدا ئەو شتێیە کە مێشی لێ ئافراند، لەم سۆنگەوە بوو کە مێش لەشێ تەواوترەو ئەو شتێیە بۆی دەلوا بەرەو تەواوتر بوون بڕوا و بەربەستی گەشە سەندنی نەبووی چونکە ئەو نەهێشتنە نیشانەی بەخیلییەو پەروەردگار هێژاترو تەواوتر لەوەیە کە ڕژدی کا. ئەو مێشە بۆیە لەو شتێیە تەواوترە چونکە خێوی ژین و هەست و هێزو جوولەو بیچم و قەوارەی سەیرە کە لەو شتێیەدا نییە؛ بۆیە مرۆڤ لەو شتێیە نەڕسکا چونکە هەل‌ومەرجی پێویست بۆ چێ‌بوونی مرۆڤی تێدا نەبوو و بە ئاوەژووی ڕەوتی ژینی مرۆڤ لە گەڕدا بوو.

بەڵام ئەوەی گەرەکی[1] مێش بوو بۆ ژین، لە پەڕ و باڵ و دەست و پێ و چاو و دەم و سەر و سک و شوێنی ڕۆچوونی خواردن و هاتنە دەری پیسایی، لێی دریخ نەکرا؛ چونکە نیازی بە دیتن بوو، سەریشی زۆر گچکە بوو و چاوی پلکداری هەڵنەدەگرت، دوو نگینەی بێ پلکی بۆ ئافراند، وەکوو دوو ئاوێنە تا هەرچی ڕەنگ و ڕوومەتە تێیدا دیار بێ و پێی ببینێ؛ هەروەها چونکە پلک بۆ سڕینی تۆز و گەردە لەسەر چاو، وەکوو زاخاو دەری ئاوێنە، پلکی چاوی پێ نەدا، کەچی بە جێی ئەوە دوو دەستی زیادەی پێ دا تا بەردەوام ئەو دوو ئاوێنە نوێ و پاکژی کاتەوە، ئەوسا دەستەکانی پێکتر دەماڵێ و لە گەردو تۆزی پاک دەکاتەوە.

مەبەست لەم باسە ئەوە بوو کە بزانی بەزەیی و دلۆڤانی و دەهندەیی پەروەردگار هەموو بوونەوەرێ دەگرێتەوەو تەنیا تایبەت بە مرۆڤ نییە؛ هەرکرم و مێشوولەیەک ئەوەی گەرەکی ژیانی بێ، بە تەواوی پێی دراوە، تەنانەت هەر ئەوشتەی بە فیلێ دراوە، بە مێشوولەیەکیش دراوە. هەروەها ئەمە بۆ مرۆڤ نەخوڵقاوە، بەڵکوو خۆیان بۆ خۆی خولقاندووە؛ هەروەک تۆ کە بۆ خۆتیان ئافراندووە؛ چونکە تۆ بەرلە ڕسکان و ئافراندن، خێوی هیچ هێژایی و سەرتری و هۆیەک نەبووی کە شیاوی ئافراندن بی و بوونەوەرانی‌تر نەیانبێ، بەڵام دەریای دەهندەیی و بەزەیی پەروەردگار ئەوەندە بەرفراوان و بەربڵاوە کە هەموو تشتێ دەگرێتەوەو یەک لەو شتانە تۆی، یەکیان مەل و یەکیان مۆرە. هەروەها هەرچەن لەسەر ئەم زەوینەدا ئەوەی ناتەواوترە فیدای تەواوترەکان کراوەو مرۆڤ چونکە تەواوترە لەو شتانەی لەسەر زەویدان، زۆربەی ئەمانەشی بۆ بەخت کراون، بەڵام لە ژێر زەوی و قووڵایی دەریادا گەلێک شت هەیە کە مرۆڤ بەشی تێیاندا نییە و لە خولقاندنی ڕواڵەت و دەروونیدا هەر ئەو بەزەییەی بە مرۆڤدا هاتووە، بەویشدا هاتووەو تەناتەت ڕەنگە ئەوەندە ڕواڵەتی ئەوان

---

[1] - گەرەک: پێویست، لازم.

رازابێتەوەو خەملێندرابێ کە بۆ مرۆڤ نەکرابێ. ئەمەش زانستی دەریاکانەو زۆربەی زانایـان لـەوە بـێ ئاگان و لێرەش راڤەناکرێ.

مەبەست لەم بەشە ئەوە بوو کە پێت وانەبێ تۆ لـە بژاردەکـانی پـەروەردگاری و هـەرچی قـازانجی بۆت نەبوو یاخۆ لێت خویان نەبوو، بلێی ئەمە بۆچ ئافرێندراوەو هـیچ بەردەبارییـەکی تێـدا نییـە. کـە تێگەیشتی و زانیت مێروولەیان بـۆ تـۆ نەخولـقاندووە، بزانـە رۆژ و مانـگ و ئەسـتێرەو ئاسمانـەکان و فریشتەکانیش بۆ تۆ نەخولقاون، هەرچەند رەنگە هەندێکیان قازانجی تۆیان تێدا بێ. هـەروەک چـۆن مێشیان بۆ تۆ نەخولقاندووە، کەچی هەرچی بیەوێ بگەنێ و بۆنی ناخۆشـی لێـوە بـێ، دەیخـواو ئـەو بۆنە لەناو دەبا. هەروەها قەساویش بۆ مێش نەخولقاوە، کەچی قازانجی مێشی تیدایە. ئەو گریمانـەت کە وادەزانی هەتاویان بۆ تۆ رسکاندووە، وەکوو ئەو خەیاڵەی مێشە کـە پێـی وایـە قەسـاویان بـۆ ئـەو خولقاندووە کە هەر رۆژ بێتە دووکان و ئـاژەڵ سـەرببڕێ و ئـەویش لـەو خـوێن و گۆشـتانەی بخـوا. هەروەها قەساو مەبەستێکی‌تری لە کاری هەیەو مێش ئـەو مەبەسـتە نازانـێ و تێناگـا، هەرچەنـد لـە خوێن و پیسابیەکانی دەخواو لەو سۆنگەوە دەژی، هەتاویش لە گەڕان و سووڕانی خۆی دۆزێکـی‌تـری هەیەو مەبەستی پەرایی پەروەردگارەو قەد بیریش لە تۆ ناکاتـەوە، هەرچەنـد پاشماوەکـەی دەبێتـە رۆناهی چاوی تۆ و لەو پاشماوەیە زەوین گەرم دادێ و روەکی لێ دەڕۆێ و خواردنی تۆ دابین دەکـا. کەواتە زۆر شت ئافرێندراوە کە لە هۆکەی ناشـارەزای و شـوکرانەبژێری ئـەوەت پـێ نـاکرێ، کـەچی پێوەندی پێتەوە هەیەو هەمووشیان نایەنە وتن؛ چەن وێنەیەکت بۆ دێنمەوە:

یـەکیان ئـەوەی کـە چاویـان بـۆ دووکـار پێـت داوە: یـەکیان ئـەوەی رێگـای خـۆتی ببـینی و پێداویستیەکانت دابین کەی لەم دونیایـەدا؛ دووەم بـۆ ئـەوەی کـە سـەیری ئافرێنـدراوانی سـەیر و سەمەرەی پەروەردگار کەی و لە گەورەیی خودا بگەی.

کە سەیری نامەحرەمێکت کرد، کوفرانی نیعمەتی چاوت کردووە؛ تەنانـەت چـاویش بـەبـێ هـەتاو تەواو نییەو بەرپێی نابینێ و بوونی هەتاویش بەندیوارە بە بوونی زەوی و عاسمان، چونکە شەو رۆژ لـە سۆنگەی زەوی و عاسمانەوە دێتە دی و کەچی تۆ بەم یەکـڕوانینە، لە هەمبەر نیعمەتی چاو و هـەتاو و زەوی و عاسمان، ناسپاسیت کردووە. بۆیە لە خەبەردا هاتووە کە: «هەرکەس گوناحـێ کـا، زەوی و ئاسمان لەحنەتی بۆ دەنێرن».

دەستیان بۆیە پێت داوە تا کاری خۆتی پێ پێک بێنی، خواردنی پێ بخۆی وخـۆتی پـێ بـشۆی و شتی وا، کە گوناحێکی پێ بکەی، ناسپاسیت کردووە؛ بۆ وێنە، گەر بە دەستی راست تـارەت بگـری و بە دەستی چەپ قورئان راگری، ناسپاسیت کردووەو لە ویستی خـودا لات داوە؛ چونکـە ویـستی ئـەو عەدڵ و دادەو دادیش ئەوەیە کە هێژا بدرێتە هێژا و کەم نرخ بدرێتە کـەم نـرخ. لـە دوو دەسـتی تـۆ

یەکیان بە هێزتر خولقاوەو سەرترە، ئەوە هێژاترە. کارەکانی تۆش دوو کـەرتن: بـڕێ سـووک و بـڕێ هێژا؛ دەبێ هێژاکان بە راست جێبەجێ کەی و سـووکەکان بـە چـەپ، تـا دادوەرانـە جوولابێتیـەوە؛ ئەگینا وەکوو چوارپێ هۆزانی و دادوەریت فەوتاندووە.

گەر ئاوی دەمت بەرەو قیبلە تف کەیتەوە، ناسپاسی نیعمەتی لا و قیبلەت کـردووە. چونکـە رەخ و لا، هەموو چوون یەکن، کەچی پەروەردگار بۆ چاکەی تۆ دابەشیکردن و یەکیانی کردە قیبلـە، تـا لـە کاتی پەرستندا روو لەوێ کەی و بەم چەشنە دامرکی و هێور بیتەوەو خانوویەکی بە ناوی خـۆی دانـا، تا رووی لێ بکەی.

کارەکانی تۆ هەندێکیان سووکن وەکوو ئاودەستچوون و ئاوی دەم تفاندنـەوەو هەنـدێکیان هێـژان وەکوو دەسنوێژ شۆردن و نوێژ خوێندن؛ کە هـەموویان هاوشـان بـزانی وەکـوو چوارپـێ ژیـاوی و لـە بەرانبەر نیعمەتی ئاوەز کە داد و بەردەباری تێدا دیتە دی، مـافی قیبلـەت بـە خەسـارداوە. هـەروەها گەر بۆ نموونە بە بـێ هـۆ، لقـی دارێ بـشکێنی یـان هەلالـەی دارێ بـوەرێنی، نیعمـەتی دەسـت و نیعمەتی دارت بە فێڕۆ داوە. چونکە ئەو لقە کە ئافرێندراوەو دەماریان تێدا دانـاوە تـا خـۆراک بخـوا و هەناسەبکێشێ و گەورە بێ و گەشە بکاو بگاتە ئەو دۆزەی بۆی رسکاوە؛ کە رێگـای گەشـەی دابـڕی، ناسپاسیت کردووە، مەگین ئەوەی نیازت پێ بێ و لە رێی گەشەو تەواوتربوونی خـۆت پێویـستت پـێ بێ، ئەوسا رەوایە کە ناتەواوێ بکرێتە فیدای تەواوتربوونی تەواوێ. بەلام گەر لـە مالـی کەسـێکی دی بشکێنی، ناڕەوایە، هەرچەند نیازیشت پێ بێ؛ چونکە نیازی خێوی ئەو دارە سـەرترە لـە نیـازی تـۆ. هەرچەند لە راستیدا بەندە خودانی هیچ شتێ نییە، بەلام دونیا وەکوو خوانێکە و نیعمەتەکانی دونیـا وەکوو خۆراکن کە لەسەر ئەو خوانە رانراوە و بەندەکانی خواش وەکوو میوانـانی دەوری ئـەو خوانـەن؛ کەس خێوی ئەو خوانە نییە، بەلام چونکە هـەر پاروویـەک بـۆ هـەموان بـڕناکا، هـەرچی میوانێـک دەستی بۆ راکێشا تا بینێتە نێو دەمی، رەوا نییە میوانانیتر دەستی بـۆ بـەرن و لێـی بـسێنن. مالـی بەندەکان پتر لەمە نییە.

هەروەها گەر میوانێک پێی نەکرا خواردن هەلگرێ و لە شوێنێکی دابنـێ کـە کـەس دەسـتی پـێ رانەگا، کەس بۆی نییە لە دونیا پتر لە نیازی هەلـگرێ و بـە کـاری ببـاو لـە خەزانـەدا هـەماری کـاو نەیداتە نیازمەندان. بەلام ئەمە لە فتوای روالەتدا نایێ، چونکە نیـازی هەرکـەس خویـان نییـەو گـەر ئەم باسە ئاشکرا کەین، رەنگە وای لێ بێ کە هەرکەس مالی کەسیتر دابگرێ و بـلێ تـۆ نیـازت پـێ نییەو بیدەرە من. کەواتە، بە ناچار ئەم باسە درێژە نادەین، بەلام ئـەم کـارە بـە ئـاوەژووی هۆزانییـە. لەم سۆنگەوە بەرگری کراوە کە مالی زۆر کۆوە مەکەن، نـەخوازەلا خـواردن کـە ژیـنی خەلـکی پـێ دابین دەبێ. ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەو کەسەی بژیوی ژینی خەلکوخوا بشارێتەوە تاکوو گـران بـێ و

بە گران بیفرۆشێ، قازانجی زۆری دەس دەکەوێ، دەکەوێتە بەر لەحنەتی خـودا؛ چونکـە بـەم جـۆرە خواردن ناگاتە دەست نیازمەندان. ئەم کارە بۆ زێڕو زیویش حەرامە، چونکە خـوا زێـڕو زیـوی بـۆ دوو شت ئافراندووە:

**یەکەم** بو پیشاندانی نرخی کالایە کە هەرکەس بزانێ ئەسـپێک چـەن غـولام نرخـی هەیـە، یـان خولامێک بایی چەن دەست جلکەو هەموو ئەمانە دەبێ پێکـەوە ئـاڵ و وێـر بکـرێن، کەواتـە شـتێک پێویستە تا پێوەری نرخی هەموویان بێ: زێـرو زیـوی بۆیـە ئافرانـد تـا وەکـوو سـەرۆکێک ئاسـت و رادەی هەرشتێ بزانێ. کەواتە، هەرکەس هـەماری کـاو بیـشارێتەوە، وەکـوو ئەوەیـە کـە سـەرۆکی موسوڵمانانی بە دیل گرتبێ. ئەوەش کە لە زێڕو زیو گۆزەو دەفر چێ دەکا، وەکـی ئەوەیـە کەسـێک سەرۆکی موسوڵمانان بگرێتە بێگارو کۆڵی پێ بکێشێ؛ چونکە گـۆزە بـۆ هەڵـگرتنی ئـاوەو بـە قـوڕو کانزای‌تر ئەوەش چێ دەکرێ.

**هۆی دووەم** ئەوەیە کە ئەم دوو گەوهەرە هێژاو بەنرخن و بەمانە هـەموو شـتێک دابـین دەکـرێ و هەموو کەس دەیانەوێ، چونکە هەرکەس زێڕی هەیە، هەموو شـتێکی هەیـە. رەنگـە ئـەوەی جلـک دەفرۆشێ، پێویستی بە خواردن بێ، کەچی ئەوەی کە خواردن دەفرۆشی هـیچ پێویـستی بـە جلـک نەبێ و دەگەڵ جل‌وبـەرگی ئاڵـوویر نـەکا. پـەروەردگار زێـڕوزیوی ئافرانـدو هێـژاو بـەنرخی کـرد تـا مامەڵەی پێ بکرێ و هەرکەس هەر شتێکی پێویستە، پێی بیکرێ. بەڵام کە زێڕیان بە زێـڕ و زیویـان بە زیو فرۆت و لەم فرۆتنە قازانجیان کـرد، ئـەم دوانـە پەرژاونەتـە سـەر یـەک و دیلـی یـەکتربوون و کارەکانی‌تر پێک ناهێنن.

کەواتە، پێت وانەبێ لە شەرعدا شتێک هەیە لە بازنەی هۆزانی و داد بـە دەربـێ، بەڵـکوو هـەرچی هەیە، هـەر بـەو چەشـنەیە کـە دەبـێ ببـێ. بـەڵام هەنـدێ لـەو هۆوانـە ئەوەنـدە وردن کـە تـەنیا پێغەمبەران دەیزانن و هەندێکیش بە تەنیا زانایان فامی دەکەن. هەروەها هەر زانایەک کە لە رواڵـەت بەولاوە چیدی نەزانێ، زانستەکەی ناتەواوە و لە خەڵکی رەمەکی نزیکترە؛ بـەڵام کـە ئـەم هۆوانـەی زانی، ئەوەی مەلایان بە مەکرووهی دەزانن، ئەو بە حەرامی دەزانێ؛ تەنانەت دەڵـێن گەورەیـەک بـە هەڵە، سەرەتا پای چەپی کردە نێو پێلاوەکەی، لە کەفارەی ئەو کارەیدا چـەن خـەروار گـەنمی دا. بەڵام گەر مرۆڤێکی ئاسایی و رەمەکی لقی دارێ بشکێنێ، بەرەو قیبلە تف کاتـەوە، یـان بـە دەسـتی چەپ قورعان راگرێ، چونکە بـۆ خـۆی ناتـەواوە، لۆمـەی نـاکرێ. ئـەو کـەسـە رەمەکییـەو خەڵـکی رەمەکیش لە چوارپێ نزیکترە و توانی ئـەم کارانـەی نییـە؛ چونکـە بـارودۆخی وی بـە چەشـنێ لـە هۆزانی بە دوورە کە ئەم وردە کارییانە لە ژینیـدا خویـان نـیین. وەکـوو ئـەوەی کـە گـەر کەسـێک مرۆڤێکی ئازاد لە کاتی نوێژی هەینیدا بفرۆشێ، کەس لۆمەی ناکا کە لـەم دەمـەدا مامەڵـە حەرامـە؛

چونکە فرۆشتنی مرۆڤێکی ئازاد، ئەوەندە گوناحێکی گەورەیە کە کرێتی مامەڵەی کاتی نوێژی هەینی دادەپۆشێ. یان گەر کەسێک لە نێو میحرابداو پشت بە قیبلە کاری ئاودەست کا، کەس تیزی تێ ناگرێ کە: بۆچی پشت لە قیبلە دادەنیشی؟ چونکە دانیشتن بۆ ئاودەست لە میحراودا ئەوەندە کرێت و نالەبارە، ئەو وردەکارییەی‌تر دادەشارێ. لەم سۆنگەوە کاری خەڵکی رەمەکی ئاسان دەگیرێ. فتوای رواڵەتی بۆ مرۆڤی ئاساییە. بەڵام رێبگاری رێی خودا نابێ سەیری فتوای رواڵەت کا، دەبێ ئاگەداری ئەم وردەکارییانەش کاو لە دادو هۆزانیدا لە فریشتەکان نزیک کەوێ؛ ئەگینا وەکی مەردومی رەمەکی لە وازهێناندا نزیکی چوارپێیان دەکەوێ.

**شرۆڤەی ئەوەی کەراستەقینەی نیعمەت کامەیە**

بزانە، هەرچی پەروەردگار ئافراندوویە، لە ئاست مرۆڤدا چوار کەرتە:

**یەکەم،** ئەوەیە کە هەم لەم دونیایەو هەم لە دوارۆژ بە قازانجە؛ وەکوو زانست و رووی گەش و ئاکاری بەرز. لەم دونیایەدا نیعمەتی راستەقینە هەر ئەمەیە.

**دووەم،** ئەوەیە کە لە هەردوو دونیادا زیانکارە، وەکوو نەزانی و ئاکارنزمی. ئەمە بەڵای راستەقینەیە.

**سێیەم،** ئەوەیە کە لەم دونیایەدا هۆی ئاسوودەییەو لەو دونیا هۆی رەنج و ئازار؛ وەکوو زۆروزەوەندەبوونی سامانی دونیاو چێژێ وەرگرتنی. ئەمە بۆ نەزانان نیعمەتە و بۆ زانایان نەگبەت. ئەمە سەربهوردی ئەو کەسەیە کە زۆر برسیەو هەنگوینی دەست دەکەوێ، کەچی ژاری تێکەڵ کراوە: ئەوەی گێل و نەزان و گەوجە و نەزانێ ژاری تێکەڵ کراوە، وەکوو نیعمەت سەیری دەکا و چابرسیتیەکەی زیانی ئەو ژارە دادەشارێ، بەڵام ئەوەی ژیرو زانایە بە بەڵا و زیانی دەزانێ.

**چوارم،** ئەوەیە کە رەنج و ئازاری ئەم دونیایەو ئاسوودەیی دوارۆژە؛ وەکوو کۆشەوەو دژایەتی دەگەڵ ئارەزووەکانی نەفس. ئەم نیعمەتە لە لای زانایان وەکوو دەرمانێکی تفت و تاڵە بۆ نەخۆشانی ژیر؛ بەڵام بۆ مەردومی گەوج و نەزان بەڵایە.

**سەرنج**

بزانە، زۆربەی هۆکانی دونیا ئاوێتەن، هەم شەڕیان هەیەو هەمیش خێر؛ بەڵام ئەوەی قازانجی پتر لە زیانی بێ، نیعمەتە، ئەمەش بە گوێرەی خەڵکی دەگۆڕدرێ. چونکە بۆ زۆربەی خەڵکی ماڵ بە قەدەر نیاز، قازانجی پتر لە زیانیەو زۆرتر لە نیاز، زیانی پتر لە خێریە؛ کەسی واش هەیە کە نەختێ سامانیش زیانی بۆ هەیە، چونکە گەلێک چاو برسێتی بەسەریدا داسەپاوە، کەچی ئەگەر هیچی

نەبوایە، هیچی نەدەویست؛ کەسیش هەیە چونکە تەواو و کاملە، سامانی فـرەش بـۆی بـێزیانـەو لـە کاتی نیازی نیازمەنداندا یارمەتیان دەدا. کەواتە، بـەم پێیـە تێگەیـشتی کـە بـووزدەخـوا شـتێک بـۆ کەسێک خێر بێ و بۆ کەسێکیتر زیان و بەلا.

**سەرنج**

بزانە، ئەوەی خەلکی بە چاکی دەزانن لەم سێ دۆخە بەدەر نییە: یان هەر لەم کاتەدا خۆشـە، یـان لە داهاتوودا بە کەلکە، یا لە خۆیدا جوانە. ئـەوەش کـە بـە شـەڕی دەزانـن. یـاخۆ هـەر لـەو کاتـەدا ناخۆشە، یا لەداهاتوودا زیانی هەیە، یاخۆ لە خۆیدا کرێت و نەگونجاوە. کەواتـە، چـاکی تـەواو ئەوەیـە کە هەرسێکی ئەم واتایانەی تێدا کۆوەبێ، کە هەم خۆش بـێ، هـەم بـەدەو بـێ و هـەم بـە کەلـک. ئەوەش بێجگە زانست و هۆزانی چیدی نییە. هەروەها خراپەی تەواویش نەزانییە، کە هـەم ناخۆشـەو هەم بێ کەلکەو و هەم دزێو. هیچ شت لە زانست خۆشتر نییە، بەلام بۆ ئەوەی دلـی نـەخۆش نـەبێ. نەزانیش لە کاتدا ناخۆش و زیانبارە، چونکە هەرکەس شتێ نەزانێ و بیەوێ کـە بیزانـێ، ژانی نـەزانی خۆی چاک دەزانێ. نەزانی، گەلێک کرێتە، بەلام ئەم دزێوییە لە روالەتدا دیـار نییـە و لـە ناخیدایـەو روومەتی دلی تێک دەداو لە دزێوی روومەت کرێتترە. شت هەیـە کـە ناخۆشـە، بـەلام لـە داهـاتوودا بەکەلکە، وەکوو بڕینەوەی قامکی دەست لە ترسی فەوتانی دەست. شـتیش هەیـە لـە بارێکـەوە بـە کەلکەو لە لایەکیترموە زیانی هەیە، وەکوو ئـەوەی لـە ترسـی وەرگـەڕان و فـەوتانی گەمیـە، مـال-وسامان دەهاوێژێتە نێو دەریا تا گیانی بپارێزێ.

**سەرنج**

خەلکی دەلێن: هەرچی خۆش بێ، نیعمەتە. چێژ وخۆشی سێ ئاستی هەیە:

**یەکەمیان** ئەوەیە کە بێفەڕترو سووکترە و ئەوەش خۆشی و چێژی زگ و ژێرزگە؛ چونکـە زۆربـەی خەلکی مەبەستیان هەر ئەمەیە و خەریکی ئەم خۆشییەن و هەموو شـتێکیان بـۆ ئـەوە دەوێ. هـۆی سووک بوونەکەی ئەوەیە کە سەرلەبەری چوارپێیان لەم چەمکەدا دەگەل مرۆڤ هاوشـانن و تەنانـەت زۆریان لەم بابەتەدا لە مرۆڤ تامەزرۆترو بەهێزترن؛ چونکە خواردن و جووتبوونی چوارپێیـان پتـر لـە مرۆڤە. تەنانەت مێش و مێرووڵەو کرمیش لەم بابەتەدا هاوشانی مرۆڤـن و ئـەوەی سـەرجەمی ژیـن و کاروباری خۆی بۆ ئەوە تەرخان کا، خۆی گەیاندۆتە ئاستی مێروولان.

**دووەم**، چێژی زالبوون و داسـەپان و سـەرۆکایەتی و بەرزییـە بەسـەر خەلـکدا؛ ئەمـەش بـەهێزی تووڕەیی پێک دێ. هەرچەن لەوەی پێشوو سـەرترە، بـەلام ئـەمیش سـووک و کـەم نرخـە؛ چونکـە

هەندێ لە ئاژەڵان لەم چەمکەدا ئامبازو هاوشانی مرۆڤن، وەکوو شێر و پڵەنگ کە پتر لە مرۆڤ تامازرۆی گەورەیی و دەسەڵاتن.

ئاستی سێیەم، چێژی زانین و هۆزانی و ناسینی پەروەردگارو ئافرێندراوە سەیر و سەمەرەکانیە و ئەمە هێژاترینیانە؛ چونکە هیچ چوارپێیەک بەشی تێدا نییەو ئەمە دانستەی فریشتەکان و تەنانەت پەروەردگارە. هەرکەس تەنیا لەمە چێژ دەباو بێجگە لەمە هۆگری چیتر نییە، تەواوە؛ ئەوەش هیچ چێژێک لەمە نابا، تەواو نوقسانەو تەنانەت بگرە نەخۆشە و خەریکی فەوتانە. زۆربەی باوەڕداران هەم چێژ لەمەیان دەبەن وهەمیش لەوانیتر. بەڵام ئەوەی چێژی ناسینی بە سەردا زاڵە، ئەوانیتر لە ژێر سای ئەمدا بەرپیوار و نادیارن؛ ئەوەش ئەوانیتری بە سەردا داسەپاوەو بۆ چێژ لە ناسین‌بردن دەبێ زۆر لە خۆی بکا، نزیک بە ئاستی نوقسان کەوتووە. گەر تێبکۆشێ ناسین بەسەر دڵیدا زاڵ بکا، تای چاکەکانی قورستر دەبێ.

## شرۆڤەی سەرجەمی جۆرەکانی نیعمەت و ئاستەکانی

بزانە، نیعمەتی راستەقینە، بەختەوەری دوارۆژە؛ ئەمە لە خۆیدا هێژاو بە نرخە، نە بۆ گەیشتن بە شتێکیتر. ئەو نیعمەتەش چوار شتە: **یەکەم** ژینێک کە فەوتانی بۆ نییە. **دووەم** شادییەک کە خەم رێی تێنابا. **سێهەم**، زانستێ کە قەد زەنگاری نەزانی دایناگرێ. **چوارەم**، بێنیازییەک کە قەد هەژاری و نەداری توخنی ناکەون. بە کورتی، ئەمە لەگەڵ چێژی دیداری بینایی چاوان یەک دەگرن و دەبێتە چێژێک کە قەد کەمایەسی و پەژارە رێی پێ نابەن و نیعمەتی راستەقینە هەر ئەمەیەو لە راستیدا نووک‌وبەدی نیعمەتەکانی دونیا بۆ گەیشتن بەم تەختەیە و ئەوان لە خۆیاندا ئامرازن نەک دۆز و مەبەست. نیعمەتی تەواو ئەو شتەیە کە خۆیان لە خۆی بوێ، نەک شتیتر. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «العَیشُ عَیشُ الآخِرَة». ئەمە جارێک پێغەمبەر لە جەنگەی خەم و کەسەردا گوتی تا لە خەمی دونیا هێور بێتەوە. جارێکیش لە تۆفی شادی «حج الوداع»دا گوتی. کاتێ کە کاری بە ئەنجام گەیاندبوو و خەڵکی روویان تێنابوو و ئەویش سواری پشتی حوشترێ بوو دەگەڕایەوەو خەڵکی لەسەر چۆنییەتی کردەوەکانی حەج پرسیان پێ دەکرد. کە ئاوەها شتێکی بینی ترسا خۆشەویستی دونیای بە سەردا زاڵ بێ، بۆیە ئەمەی گوت.

یەکێک گوتی: «پەروەرندەم! من نیعمەتی تەواوت لێ داوا دەکەم». پێغەمبەر ژنەوتی و پرسی: «دەزانی نیعمەتی تەواو چییە؟» گوتی: «نە». فەرمووی: «ئەوەیە کە برۆیتە نێو بەهەشتەوە». بەڵام ئەو نیعمەتانەی کە لە دونیان، هەرکامیان هۆیەک بۆ گەیشتن بە بەختەوەری دوارۆژنین، لە راستیدا نیعمەت نین.

ئەوەی هۆی بەختەوەری دوارۆژە، شانزدە بەشە: چوار لە دڵدا، چوار لە لەشدا و چوار لە دەرەوەی لەش و چواریش لە کۆوە بوونی ئەم دوانزە بەشە.

**ئەو چوارەی کە لە دڵدان بریتین لە:** زانستی موکاشفەو کردەوەو پارێزگاری و دادوەری.

موکاشفە ئەوەیە کە پەروەردگارو دانستەکانی و فریشتەکان و پێغەمبەران بناسیێ.

کردەوەکان ئەوانەن کە لەم پەرتووکەدا لە سەریان ئاخاوتین و گوتمان ئەمانە رێی هەڵەتی رێبازی خودان، هەروەک لەبەشی کوشندەکان راڤەکراو هەروەک لە بەشی عیبادات و کردەوەکاندا گوتمان، توێشووی رێگایەو هەروەک لە کتێبی رزگارکەرەکاندا هاتە گوتن، قۆناغەکانی رێگایەو بە گشتی لەم کتێبەدا بەوردی راڤە کراوە.

پارێزگاری ئەوەیە کە بە تەواوی ئاکارمان بەرزکەین و هەردوو لەشکری شاوەت و تووڕەیی تێک بشکێنین.

دادوەری ئەوەیە کە دوو لەشکری شاوەت و تووڕەیی نەفەوتێنیێ، چونکە ئەوە زیانێکی زۆر گەورەیەو هەروەها نەهێڵیێ بەسەریدا زاڵ بن، چونکە ئەوەش سەربزیویە. بەڵکوو دەبیێ بە کێشانەیەکی راست رایانگریێ و دادوەرانە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ کا. هەروەک فەرمووی ﴿أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ، وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾[1].

ئەم چوارە ناگەنە ئەنجام تا ئەو چوار بەهرەی کە لە لەشدان کامڵ نەبن، ئەوانەش بریتین لە: تەندروستی، هێز، جوانی و تەمەنی درێژ.

ئەمەی کە گەیشتن بە بەختەوەری دوارۆژ پێویستی بە تەندروستی وهێز و تەمەنی درێژ هەیە، شراوە نییە؛ چونکە زانست و کردەوەو ئاکاری جوان و ئەو هێژاییانەی کە لە دڵی مرۆدایەو باسمان کرد، تەواو نابن تا ئەوەی کە ئەمانەش بە دەست نەین. بەڵام جوانی، کەمتر پێویستە، هەرچەند نیازی دیمەنی جوان رەواترەو جوانیش وەکوو ماڵوسامان و پلەو پاگەیە. ئەوەش لە پێکهێنانی نیازە سەرەکییەکانی دونیا کاریگەر بیێ، لە پەسلانیشدا بەکار دیێ، چونکە کاروباری گرینکی دونیا دەبنە هۆی ئارخەیانی دوارۆژ و دونیا مەزرای دوارۆژە. هەروەها دیمەنی جوان و شووشەیی، باس لە جوانی و بەدەوی دەروون دەکا و ئەوەش سەرنجێکی تایبەتی پەروەردگارە کە لە کاتی لەدایک-بووندا دەدرێتە مرۆڤ. زۆرتر وایە کە هەرکەس بە دیمەنی جوانەوە خولقا، ئاکاریشی جوان و لە بارە. پێغەمبەر فەرمووی: «داواکاریتان لە دیمەن جوانان بخوازن». عومەر گوتی: «کاتیێ هەواڵبەریێ دەنێرنە شوێنیێ، بە دیمەنی خۆشناو بنێرن». زانایان گوتوویانە: «کە پێشەواو بەرنوێژەکانتان لە

---

١ - (قورئان، ٨/٥٥و٩) کە لە ئەندازە دەرنەچن؛ کێشانەتان بەرانبەر بیێ و نەکا تەرازووتان سەرکا. (هـ)

زانست و دەنگ و پارێزکاریدا یەکسان بوون، جوانترینیان هەڵبژێرن». مەبەست لەمە بزووتنی شاوەت نییە، چونکە ئەوە پیشەی ژنانە، بەلام بەژنی زراف و دیمەنی جوان، کە دڵ و چاو لە دیتنی وەڕەز نابن، چاترە.

بەلام ئەو نیعمەتانەی لە دەرەوەی لەشن و پێویستن بریتین لە: ماڵوسامان و پلەو پاگەو بنەماڵەو خێزان و هۆزو تۆرمەی گەورە.

**نیازی دوارۆژ بە سامان:** ئەوەی کە هیچی نییەو شەوورۆژ کەلکەڵە و بیری ئەوەیە کە بژێوی ژینی دابین کا، کەنگێ دەپەرژێتە سەر زانست و کردەوە بۆ دوارۆژ؟ کەواتە، ماڵی دونیا بە قەدەر نیاز، نیعمەتە بۆ دین.

**پلەوپاگە**، ئەوەی پلەو پاگەو جێگەیەکی بەرزی لەکۆمەڵگادا نییە، هەموو دەم لە پەستی و سووکیدایەو لە تەمای پیسی دوژمنانی هێمن نییە؛ بەلام زۆروزەوەندەبوونی سامان و پلەوپاگە، زیانی فرەترە. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی بەیانی رادەبێ و تەندروستەو هێمن و خەمی نانی ئەو رۆژەی نییە، وەکوو ئەوەیە سەرلەبەری دونیا هی ئەوبێ». ئەمەش بە بێ سامان و پلەوپاگە پێک نایە. پێغەمبەر فەرمووی: «نعمَ العَونُ عَلی تَقوَی الله المالُ؛ ئاریکاریکی زۆر چاکە سامانی بە پارێزکاری».

خێزان و منداڵ نیعمەتە بۆ دین، چونکە خێزان پاش کارو ماندوویەتی زۆر، دەبێتە هۆی ئارخەیانی و دووری لە شاوەت. بەم بۆنەوە پێغەمبەر فەرمووی: «بۆ پیاوی دین، ژنی شیاو یاوەرێکی زۆر هێژایە». عومەر گوتی: «لە ماڵی دونیا چ کۆوە کەین؟» فەرمووی: «زمانی زیکربێژو دڵیشوکرانەبێژو ژنێکی پارێزکار». منداڵیش پاش مردن دەبێتە هۆی نزای بەخێر؛ لە ژینیشدا ئاریکارمو منداڵانی پیاو وەکوو دەست و پێ و پەڕوباڵن کە کارەکانی بۆ پێک دێنن. ئەمە نیعمەتە گەر لە بەلاو مێملیان دوورەپەرێز بێ، چونکە دەگەڵ خۆیان بڕشت و هیمەت ناهێننە نێو دونیاوە.

**تۆرمەی هێژاش** نیعمەتە، چونکە پێشەوایی دانستەی قورەیشە. پێغەمبەر فەرمووی: «تَخَیَّروا لِنُطفَکُم الاَکفاء وَ اِیّاکُم وَ خَضراء الدِّمَن؛ واتە: توو لە شوێنێکی شیاودا بچێنن و لە شینایی نێو زبڵدان خۆ بپارێزن». گوتیان: «ئەوە چییە؟» فەرمووی: «ژنی خوشیک و بەدەوی ناجسن». بزانە مەبەستی لەم تۆرمەو رەچەڵەکە گەیشتن بە سەرۆکی دونیا نییە، بەڵکوو پێوەندییەک کە گەڵ دیندار و زانا بکرێ، خۆی نیعمەتێکی بەنرخە و ئاکار پتر لە تۆرمە کاریگەرە و کە بنەماش چاک بوو، لق و پۆش چاک دەبن، هەروەک پەروەردگار فەرمووی: وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا[1].

---

١- قورئان ۸۲/۱۸. باوکیشیان لە مێرخاسان بوو. (هـ)

**بەلام ئەو چوار نیعمەتەی کە ئەم دوازدە نیعمەتە کۆوە دەکەن بریتین لە:** ڕێنومایی و گەشەو پشتیوانی و پتەوی و خێرایی، کە بە سەرجەمی ئەمانە دەڵێن: سەرکەوتن. هیچ نیعمەتێ بەبێ‌سەرکەوتن، نیعمەت نییە. مەبەست لە سەرکەوتن، هاودەنگییە لە نێوان چارەنووسێ کە پەروەردگار ڕەچاوی دەکاو و ویستی مرۆڤ. ئەمە هەم بۆ شەڕ بەکار دەبرێ و هەم بۆ خێر، بەلام بە گوێرەی خووی خەڵکی، بۆتە زاراوەیەکی تایبەت کە باس لە کۆوەکردنی ویستی بەندەو چارەنووسێ کە قازانجی بەندەی تێدابێ دەکا. ئەمە بە چوار شت کامڵ دەبێ:

**یەکەم** ڕێنومایی، کە کەس لێی بێ نیاز نییە. چونکە گەر کەسێک تامازرۆی بەختەوەری دواڕۆژ بێ و لە ڕاستەڕێ شارەزا نەبێ و تووشی لاڕێ بێ، چ کەلکی هەیە؟ کەواتە ئافراندنی هۆکار بە بێ ڕێنومایی چ قازانجی نییە. بەم بۆنەوە پەروەردگار منەتی بە سەر هەردووکیان ناوەو گوتوویە: ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ[1]؛ هەروەها گوتی: وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ[2]؛ ئەم ڕێنومایییەش سێ ئاستی هەیە:

**یەکەم** ئەوەیە کە جیاوازی نێوان خێروشەڕ بزانێ و ئەم تێگەیشتنەی بە ژیران داوە: هەندێکی بە ئاوەز و هەندێکیشی لە زمانی پێغەمبەرانەوە گوتووە. ئەمەش کە فەرمووی: وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ[3]، ویستی ڕێی چاک و خراپی پێ بنوێنێ. ئەمەش کە گوتی: ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ[4]، ویستوویە بڵێ ئەوانەی لە ڕێنومایی بێوەرن، یا بە بۆنەی چنۆکی و لووتبەرزییە، یا پەرژانە سەرکاری دونیاو گوێ نەدانە بە پەیڤی پێغەمبەران و زانایان؛ ئەگینا هیچ ژیر و خاوەن ئاوەزێ نییە کە ئەمەی پێ نەکرێ.

**ئاستی دووهەم،** ڕێنومایی تایبەتە کە نێوانی هەڵس‌وکەوتی دونیا وکۆشەوەی ڕێی دین کەم کەم شرۆڤە دەکا و ڕێگای هۆزانی ئاوەڵا دەکا. ئەمەش بەرهەمی کۆشەوەیە؛ هەروەک گوتی: وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا[5]، فەرمووی هەرکە هان بدا بۆ گەیشتن بە ڕێی خۆمان ڕێنومایی دەکەم، نەیگوت بۆ لای خۆمی ڕێ پێ دەنوێنم، ئەمەش کە گوتی: وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدًى[6] هەرئەمەی

---

١- (قورئان ٢٠/٥٠) پەروەرندەی ئێمە ئەو کەسەیە کە بە هەموو دەسکردی خۆی هەموو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە.(هـ)

٢ - (قورئان ٨٧/٣) بۆ هەر شت ئەندازەی دانا و ڕێی نیشان دا. (هـ)

٣ - (قورئان ٩٠/١٠) ڕێگەی هات و نەهاتیشمان نیشان نەدا؟ (هـ)

٤ - (قورئان ٤١/١٧) ڕێگەی بەرەو خۆمان شانی هۆزی سەموودیظ دا. (هـ)

٥ - (قورئان ٢٩/٦٩) ئەوانە لەڕای ئێمەدا ڤوونە خەزا، ئێمەش ئەوان بە ڕێگەی خۆماندا دەبەین. (هـ)

٦ - (قورئان ٤٧/١٧) ئەو کەسانەش کە هاتوونە سەر ڕاستەڕێ، پتر شارەزایان دەکا.

مەبەستە.

**ئاستی سێهەم**، ڕێنومایی تایبەت بە تایبەتانە. ئەم ڕۆناهییە لە جیهانی پێغەمبەران و یارانی تایبەتی خوادا پێ دەبێ. ئەمەش ڕێبردنە لای بینایی چاوانە، نەک بۆ سەر ڕێی پەروەردگار. ئەمە بە چەشنێکە کە ئاوەز بۆی نییە خۆی ڕێ بباتە سەری و لێی شارەزابێ و ئەوەی کە گوتی: قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰ[1]، مەبەستی ئەوە بوو کە ڕێنومایی تەواو و ڕەها ئەمەیەو چونکە بە ژیانەوە ناوی بردو گوتی: أَوَمَن كَانَ مَيۡتًا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورًا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ[2].

گەشە ئەوەیە کە لەگەڵ ڕێنومایی، تا مازرۆیی ڕێگابڕینی لە دڵدا بێنێتە دی؛ هەروەک گوتی: وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ إِبۡرَٰهِيمَ رُشۡدَهُۥ[3].منداڵ کە پێگەیشت و زانی دەبێ چۆن ماڵ ڕاگرێ و ڕاینەگرت، پێگەیوی پێ ناڵێن، هەرچەند ڕێی پێ نوێندرابێ.

بەلام **پتەوی و خێرایی** ئەوەیە کە ئەندامانی لە سەرکاری چاک بە ئاسانی و خێرایی ببزوێنەوە تا زووتر بگەنە مەبەست. کەواتە، بەرهەمی ڕێنومایی لە ناسینەو ئەنجامی گەشە لە ویست و خوازۆکییەو بەری خێرایی لە هێزو وزە و ئامرازی ڕێگا بڕینە.

بەلام **پشتیوانی** بریتیە لە یارمەتی ناردن لە نادیارەوە بۆ سەر دەروون -کە بریتییە لە ژیری و بینایی- و بۆ سەر ڕواڵەت -کە بریتییە لە هێزی ڕۆیین و بزووتن؛ هەروەک گوتی: أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ[4]. ئەمە دەبێتە سەرچاوەی بێخەوشی و دووری لە گوناح. بەم چەشنە کە لە دەروونەدا کۆسپێک لە هەمبەر گوناح چێ دەبێ و بە هۆی ئەو کۆسپەوە بە تەکووزی دەزانێ کە تاریکی ڕێگا لە کوێڕایە؛ هەروەک گوتی: وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦ[5].

ئەمانە بوون ئەو نیعمەتانەی دونیا کە توێشووی دوارۆژن؛ ئەمانە پێویستیان بە هۆیترەو ئەو هۆوانەش هۆیتریان گەرەکە، تا لە ئەنجامدا دەگەنە «دليل المتحيّرين و ربّ الارباب»، کە هۆی هەموو هۆکانە. ڕاڤەی سەرجەمی ئەم زنجیرە هۆوانە دوورو درێژەو لەم کتێبەدا پتر لەمەی بێژرا نابێژرێ.

---

١ - (قورئان ٧١/٦) بێژە: ڕێی ڕاست هەر ڕێگەی ڕوو بە خودایە. (هـ)

٢ - (قورئان ١٢٢/٦) ئاخۆ کەسێ کە مردوو بوو، ئێمە زیندوومان کردەوە و ڕووناکیەکمان خستە پێشی بەسەربەستی لەناو خەڵکا بوخلێتەوە، وەک کەسێک کە لە ناو تاریکیدایە. (هـ)

٣ - (قورئان ٥١/٢١) لەمەوبەریش ئیبراهیممان لەکار شارەزا کرد. (هـ)

٤- (قورئان ١١٠/٥) گیانی هەرە پیرۆزم ناردە یاریت. (هـ)

٥- (قورئان ٢٤/١٢) وێ پەلاماری ئێ]میدا و ئێ]میش گەر بەڵگەی پەروەرندەی نەدیبا. (هـ)

## شرۆڤەی هۆی گوێنەدانی خەڵکی بە شوکرانەبژێری

بزانە، هۆی ناسپاسی خەڵک دوو شتە:

**یەکەم**، نەشناسین و نەزانینی زۆربەی نیعمەتەکانی خودایە؛ چونکە کەس سەرلەبەری ئەو نیعمەتانە ناناسێ؛ هەروەک گوتی: وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآ[1]. ئێمەش لە کتێبی ئەحیادا هەندێ لە نیعمەتەکانی خودامان هەڵژمارد، تا بەو پێوانە بزانن کە کەس سەر لەو هەموو نیعمەتانە دەرناکاو ئەم پەرتووکە جێی ورد بوونەوەی ئەم بابەتە ناکا.

**هۆی دووەم** ئەوەیە کە مرۆڤ، ئەو نیعمەتانەی -کە گشتی و هەمووانین- بە نیعمەت نازانێ، وەکوو هەوای پاک و نەرم کە هەڵیدەمژێ و مژی فێنک و دڵی گەرم دەکاو گەر هەناسەیەکی کۆسپی تێکەوێ، بێ‌گومان دەمرێ؛ کەچی ئەمە بە نیعمەت نازانێ. ئەم نیعمەتانە سەدان هەزارن و پێی نازانێ، مەگین ئەوەی ماوەیەک لە شوێنێکدا کە هەوای پیس بێ، بەندبکرێ، یاخۆ بڕواتە گەرماوێکی گەرم و دەرکی بەسەردا داخەن. کەوایکرد، رەنگە بایەخ و نرخی ئەم نیعمەتەی بزانێ. هەروەها کەس سپاسی بینایی ناکا، مەگین ئەوەی چاوی بنیشێتە گل و ئەوسا بزانێ کە چاویشی هەیە. ئەمە وەکوو کوێلەیەکی نالەبارو سەربزیوە کە تا لێی نەدەن، بە چاکەکان نازانێ؛ کە لێی نەدەن تووشی پێنەزانی و ناسپاسی و بێ‌ئاگایی دێ. دەرمان ئەوەیە کە ئەو نیعمەتانە بەسەر کاو لە دڵی خۆیدا نوێیان کاتەوە. ئەم باسەمان بە وردی لە ئێحیادا لێک داوەتەوە. ئەمە بۆ پیاوی تەواو دەبێ.

بەڵام دەرمانی مرۆڤی ناتەواو و پڕکەمایەسی ئەوەیە کە هەموو رۆژێ سەردانی نەخۆشخانە و زیندان و مەغریبسانان کا، تا نەهامەتی و مێملی جۆربەجۆر ببینێ و تەندروستی خۆی بزانێ و پێی بزانێ، بەڵکوو سپاسی پەروەرێنەری کا. کاتێ سەردانی گۆڕستانی کرد، با ڕامێنێ و بزانێ کە ئەم مردووانە تامازرۆی یەک رۆژ تەمەنن کە هەڵەو بەڵەکانیان بسڕنەوە و قەرەبووی کەنەوە؛ بەڵام مخابن! چجار پێیان نادەن، کەچی ئەم رۆژی زۆر و فراوانی لە پێشدایە و پێشی نازانێ.

ئەوەی شوکرانەبژێری نیعمەتە گشتیەکان ناکا، وەکوو هەواو هەتاو چاوی روون، نیعمەت بەو شتانە دەزانێ کە تایبەت بە خۆین، دەبێ بزانێ ئەمە نەزانینەو نیعمەت بەوەی کە گشتی بێ، لە نیعمەت بوون ناچێتەدەر. کە تیفکرێ و رامێنێ، تێدەگا کە چاکەی تایبەتی زۆر لەگەڵ کراوە؛ بۆ وێنە: هەموو کەس پێی وایە کە ئاوەز و فامی تەواوتر و سەرتر لە فام و ئاوەزی هەمووانە و ئاکاری بەرزتر لە هەموو ئاکارێکە. بەم بۆنەوە خەڵکی‌تر بە نەفام و ئاکار نزم دەزانێ، چونکە خۆی بە خراپ نازانێ؛ کەواتە دەبێ بەجێی تیزوپلار تێگرتن لە خەڵک، سپاسی پەروەرندەی کا بۆ ئەو چاکەی دەگەڵی

---

1 - (قورئان ٣٤/١٤) ئەگەر بێنە سەرژماری چاکەی خودا، لە ژماردن دادەمێنن. (هـ)

کردوویە؛ چونکە هەموو کەس نوقسانی و کەمایەسی زۆری لە دڵدا هەیە و تەنیا خۆی پێی دەزانێ وکەس نایزانێ و بینایی چاوان، لە ژێر پەردەی بەزەیی خۆیدا حەشاری داوەو لە چاو مەردم داپۆشاوە. تەنانەت گەر ئەو شتانەی بە بیر و زەینی مرۆدا تێدەپەڕن، خویان بایە، مرۆڤ زۆری پێ دەشکایەوەو شەرمەسارو رووزەرد دەبوو؛ ئەمەش بۆ هەرکەسەو چاکەیەکی تایبەتە و دەبێ شوکرانەبژێری ئەوە کاو بیر لەو شتانەی کە نییەسی نەکاتەوە تا لە سپاس‌کردن دانەمێنێ. دەبێ بیر لەوە کاتەوە کە بە بێ ئەوەی شیاوی بێ، پێی دراوە.

کابرایەک لە لای گەورەیەک گلەوگازەی لە دەست هەژاری دەکرد. پێی گوت: «دەتەوێ دەهەزار درهەمت بێ و چاوت نەبێ؟ گوتی: نە. گوتی: ئەی فام وئاوەز؟ گوتی نە. گوتی: ئەی گوێ و دەست و پێ؟ گوتی: نە. گوتی: دەسا کەسی برای! پەروەردگار بایی پەنجا هەزار درهەم کەل و پەلی لە لاتە، بۆ گلەیی دەکەی؟» زۆربەی خەلکی کە پێیان بڵێی پێت خۆشە لە جێی فلان‌کەس بی، دەڵێن نە؛ دۆخی خۆیان پێ باشترە. کەواتە، ئەو شتەی پێی دراوە، بە زۆربەی زۆری خەڵک نەدراوەو دەبێ شوکرانەی بەجێبێنێ.

**سەرنج**

بزانە کە بۆ بەڵاو کارەساتیش دەبێ شوکرانە بژێری کەی، چونکە بێجگە کوفرو گوناح، هیچ بەڵایەک نییە کە خێری تێدا نەبێ؛ هەرچەند تۆ بە چاکەکانی بەڵا نازانی و پەروەرندەت چاتری لێ دەزانێ، چونکە بۆ هەر مێملێ پێنج شوکر فەرزە:

**یەکەم** ئەوەی کە ئەو بەڵایە بۆ لەشە و بۆ دونیایە، نەک بۆ دین و بڕوا. یەکێک بە سەهلی توستەری گوت: «دز رۆیشتە نێو ماڵەکەم و هیچی نەهێشت». گوتی: «گەر شەیتان بڕۆیشتایە نێو دڵت و باوەڕتی ببردایە، چت دەکرد؟»

**دووەم،** هیچ نەخۆشی و بەڵایەک نییە کە لەوە خراپتریش نەبێ، بۆیە دەبێ سپاسی خودا بکرێ بۆ ئەوەی لەمە خراپترت تووش نەبووە. ئەوەی شیاوی هەزار قەمچی بێ کە لێی بدرێ، کەچی سەد قەمچی لێ بدرێ، دەبێ شوکرانەبژێر بێ. گەورەیەک لە کۆڵانێکەوە تێدەپەڕی، تەشتێ پڕ لە خۆڵەمێشیان بە سەریدا کرد، سپاسی کرد گوتیان: «سپاسی چت کرد؟» گوتی: «ئەوەی شیاوی ئاوربوو، بە خۆڵەمێشێ دەرباز بوو، جێی شوکری هەیەو ئەمە نیعمەتێکی زۆر هێژایە».

**سێهەم،** سزای هەرگوناحێ کە بکەوێتە دوارۆژ زۆرگەورەترو گورچکبڕترە، گەر هەر لەم دونیایەدا سزای کەسێک درا، دەبێ زۆر شوکرانەبژێر بێ؛ چونکە زۆربەی سزاکەی دوارۆژی لە کۆڵ دەکەوێ. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس لە دونیا تۆڵەی لێ بکرێتەوە، لە پەسلاندا سزا نادرێ». جا چونکە

بەلا و کارەسات کەفارەی گوناحانن، کە تۆڵەی لێ بکرێتەوە، لە پەسلاندا سزا نادرێ. چونکە بەلا و کارەسات کەفارەی گوناحانن، کە تۆڵەی گوناحەکانی سەندەوە، ئیدی سزا بۆچی دەردێ؟ کاتێ پزیشک دەرمانی تاڵ و تفتت دەداتێ، چونکە ڕەنجی نەخۆشیت لە کۆڵ دەکاتەوە، هەرچەند خواردنی ئەو دەرمانە زۆرت ئازار دەدا، بەلام سپاسی دەکەی، چونکە بەم ڕەنجە، ڕەنجی نەخۆشیت لە مل دەکاتەوە.

**چوارم** ئەوەیە کە ئەم مێملە ڕۆژی ئەزەل لە چارەتدا نووسراوەو لە ڕێتایە. کە لەسەر ڕێت لابراو لێی ڕزگارت بوو، شوکرانەبژێریت لە سەرە. شێخ ئەبووسەعید لە ولاخەکەی داکەوت، گوتی: «اَلحَمدُلِلّه». گوتیان: «بۆچی؟» گوتی: «لە کەر داکەوتنم لە کۆڵ بووەوە؛ واتە لە سەرم فەرز بوو؛ چونکە لە چارەمدا نووسرابوو کە داکەوم».

**پێنجم** ئەوەیە کە بەلا لە دونیا لە دوو ڕەهەندەوە پاداشی دوارۆژی لە دوایە: یەکەم ئەوەی کە پاداشی بەلا و مێمل، زۆر مەزنە، بەوچەشنەی کە لە ئەخباردا باس کراوە. دووەم ئەوەیە کە هۆی هەموو گوناحەکان، خووکردنە بە دونیاوە؛ بە چەشنێ کە دونیا دەبێتە بەهەشت بۆت و گەڕانەوە بۆ لای پەروەرندەت بۆت دژوار دەبێ. ئەوەی لە دنیا تووشی بەلا هات، دڵ لە دونیا دەکەنێ ومردن بە ڕزگاربوون لە زیندان دەزانێ. هەروەها بەلا و کارەسات، بۆ ڕاهێنانی مرۆڤە. گەرمندالێ ژیر و تێگەیشتوو بێ، کاتێ بابی تەمێی دەکا، سوپاسی دەکا؛ چونکە دەزانی ئەو تەمێیە قازانجی ئەوی تیایە. لە خەبەردا هاتووە کە: «پەروەردگار، بە بەلاو کارەسات، بەهەشت بۆ هەڤالانی خۆی مسۆگەر دەکا، هەروەک چۆن پزیشک بە دەوا و دەرمان تەندروستی نەخۆشەکانی مسۆگەر دەکا».

یەکێک بە پێغەمبەری گوت: «ماڵمیان برد». فەرمووی: «خێر ناگاتە ئەو کەسەی ماڵی نەبرێت و لەشی نەخۆش نەبێ، چونکە، کە پەروەردگار کەسێکی خوش بوێ، بەلای بۆ دەنێرێ». هەروەها فەرمووی: «پلەو پاگەی زۆر لە بەهەشتدا هەیە کە مرۆڤ بەکۆشەوەی زۆریش پێی ناگا، بەلام پەروەردگار بە بەلا دەیگەینێتە ئەوێ».

ڕۆژێک پێغەمبەر سەیری ئاسمانی دەکرد، پێکەنی و گوتی: «سەرم سووڕ دەمێنێ لەوەی خودا لە چارەی برواداراندا نووسیویە؛ گەر نیعمەتیان بۆ بنووسێ، پێی خۆشە و بەهرەشی بۆ تێدایە؛ گەریش بەلاو کارەساتی بۆ بنووسێ، دیسان پێی شادەو خێرو قازانجی تێدایە بۆی». واتە: سپاس بۆ یەکێکیان دەکاو لەسەر یەکێکیشیان پشوودرێژەو لە هەردووکیاندا خێری پێدەگا. دیسان فەرمووی: «لە پەسلاندا لەبەر بەرزی ئاستی ئەوانەی تووشی بەلاو مێمل هاتوون، ئەوانەی لە بەلاو کارەسات خەلساون، دەڵێن بریا بە نینۆک گوشتی لەشمانیان لێک دەکردەوە».

یەکێک لە پێغەمبەران گوتی: «پەروەرندەم! نیعمەت بەسەر کافراندا دادەبارێنێ، کەچی بەلاو

مێمڵ بەسەر بڕوادارنتدا، بۆچی؟» فەرمووی:«چ کارەسات و مـێمڵ و چ خێـرو چاکـە، هـەمووی هـی منە. بەلام بەلا بەسەر بڕواداراندا دەبـارێنم تـا پـاک و بێخـەوش بـن ئـەو کاتـەی دەمبیـنن، هەڵـەو پەڵەیان بەو بەلایانە دادەشۆرم؛ کەچی کافرەکان چاکەیان دەگەڵ دەکـەم و خێریـان پـێ دەدەم، تـا کاتێ دەمبینن هیچ مافیان بە سەرمەوە نەبێ و سزایان بدەم».

کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە هەرکەس خراپـەکا، سـزادەدرێ -مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ[1]- سـدیق گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! بەمە چۆن دەرباز دەبین؟» فـەرمووی: «نـەخۆش ناکـەوی؟ خـەمین نابی؟ سزای هەڵەی باوەڕدار ئەمەیە».

مندالێکی سلەیمان بە رەحمەتی خودا چوو. زۆر خەمبار بوو. دوو فریشتە لـە بیچمـی دوو زەلامـدا هاتنە لای. یەکیان گوتی: «ئەی پێغەمبەری خوا! تووم چاندە زەوی، ئەم کابرایە پـای بـە سـەردا نـاو بە خەساریدا». ئەویتر گوتی: «تووی لەسەر رێگا چاندبوو، چونکە لـە چـەپ و راسـتەوە رێـی بگـارم نەبوو، بە ناچار پێم بە سەریدا نا». سلەیمان گوتی: «نەتدەزانی کە توو لەسەر رێگـادا بچـێنی، رێ لـە هاتووچۆ خالی نابێ؟» گوتی: «ئەی سلەیمان! تۆ نەتزانی کە مرۆ لەسەر رێگای مردنن کە بـە مـردنی کوڕت بەرگی پەژارەت کردۆتە بەر؟» سلەیمان لە کردەی خۆی پاشگەز بوو و داوای لێبوردنی کرد.

عومەری عەبدولعەزیز کوڕەکەی لە نێو جێگا بوو، مـەترسـی ئـەوە هـەبوو کـە قـەد هەڵنەسـێتەوە. گوتی: «کوڕم! گەر تۆ پێشتر بڕۆی و لـە تـرازووی منـدا بی، پـێم خۆشـترە تـا مـن بـڕۆم و لـە تـای کێشانەی تۆدا بم» گوتی: «بابە گیان! ئەوەم دەوێ کە تۆ دەتەوێ و زۆرتر پێت خۆشە».

هەوالیان دا بە ئیبنی عەبباس کە کچەکەت مرد. گوتی: «اِنا لِلّهِ وَ اِنا اِلَيهِ راجِعُونَ». کفنی کرد و بۆی خەرجی کردو سەدەقەیەکی بۆدا. پاشان هەستاو دوو رەکات نوێژی خوێند و گوتی: «فەرموویە ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِ[2]، من هەردوویم بە جێ هێنا.

حاتـەمی ئەسـەم گـوتی: «لەپەسـلاندا چوارکـەس دەبنـە شـایەت بـۆ چـوار تـاقم: سـلەیمان بـۆ دەوڵەمەندان، یووسف بۆ کۆیلەکان، عیسا بۆ هەژاران و ئەیووب بۆ بەلالێداوان».

ئەمەی بێژرا لە سەرشوکرانە بژێری، بۆ ئەم کتێبە بەستە.

---

١ - (قورئان ١٢٣/٤) هەر مرۆیەک کارێکی نالەبار بکا، بەو کارەی خۆی جزیا دەدرێ. (هـ)

٢ - (قورئان، ١٥٣/٢) پەنا بەرنە بەرنوێژان و خۆڕاگر بن. (هـ)

## بنەمای سێیەم - ترس و هیوا

بزانە، ترس و هیوا وەکوو دوو باڵن بۆ ڕێبگاری ڕێی خودا و بۆ گەیشتن بە پلەو پاگەی بەرزی نزیک بوونەوە لە پەروەردگار؛ چونکە ئەو هەڵەتانەی کە کۆسپ و پەردەی دیتنی پەروەردگارن، گەلێک بەرزو ئەستەمن و تا هیوایەکی راست نەبێ و تا چاو بە دیداری پەروەردگار روون نەبێتەوە، کەس ئەو ڕێگای پێ نابڕێ. هەروەها ئارەزووەکانی نەفس کە لەسەر ڕێی دۆژەهدان، خاپینۆک و تێکدەرن و داوێکی بەزەبریان هەیە، تا ترسێ لەو داوانە نەکەوێتە نێو دڵ، کەس خۆی لێی نابوێرێ. بەم بۆنەوە ترس و هیوا گەلێک هێژاو مەزنن؛ هیوا وەکوو هەوسارە کە مرۆڤ رادەکێشێ و ترس وەکوو قەمچییە کە بەندە دەپرنیگێنێتەوە. ئێمە سەرەتا باس لە هیوا دەکەین و ئەوسا با دەدەینەوە سەر ترس.

### هێژایی هیوا

بزانە، بەندەگی و پەرستنی پەروەردگار بە هیوای میهرەبانی و بەخشندەیی، چاترو جوانترە لە پەرستن بە هۆی ترس لە سزادان؛ چونکە لە هێڤی[1]، خۆشەویستی دەڕوێ و هیچ پلەیەک لە خۆشەویستی سەرتر نییە، کەچی ترس بۆنی رقی لێ دێ. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «لایَموتَنَّ اَحَدُکُم الاّ وَ هُوَ یَحسُنَ الظَّنَّ باللهِ عَزَّوَجَلَّ». واتە: نەکوا کەستان بمرێ و گومانی چاکە بە خودانی نەبا. فەرمووی خودا دەڵێ: «من لەوێم کە بەندە پێی وایە هەم. بڵێ هەر گومانێک کە پێت خۆشە بەمن ببە».

پێغەمبەر بە کابرایەک کە خەریکی گیانەلابوو، گوتی: «خۆت چۆن دەبینی؟» گوتی: «لە گوناحەکانم دەترسم و هیوام بە بەزەیی پەروەردگارم هەیە». فەرمووی: «هەرکەس لەم کاتەدا ئەم دوانەی لە دڵدا کۆوەبێ، پەروەردگار لەو شتەی دەترسێ دەیپارێزێ و بەوشتەی کە هیوای پێیە

---

١: هێڤی: هیوا.

شادی دەکاتەوە».

پەروەردگار وەحی ناردە سەر یاقووبی پێغەمبەر و پێی گوت: «دەزانی بۆچی چەنای‌چەن ساڵ یووسفم لێت دابڕی؟ چونکە گوتت: "أخافُ أن يَأكُلَهُ الذِّئبُ؛ دەترسم کە گورگ بیخوا". بۆچی لە گورگ ترسای و هیوات بە من نەبوو، بیرت لە بێئاگایی براکانی کردەوە، کەچی بیرت لە پاراستنی من نەکردەوە؟»

عەلی کابرایەکی بینی کە لەبەر زۆروزەوەندەبوونی گوناحەکانی هیوای بڕابوو، گوتی: «ناهومێد مەبە، بەزەیی خوا لە گوناحانی تۆ گەورەترە».

پێغەمبەر فەرمووی: ڕۆژی پەسلان خودا بە بەندەی دەڵێ: بۆچی کاتێ خراپکارییەکت بینی، بەرگریت لێ نەکرد؟» گەر خودا ئیزن بداتە زمانی دەڵێ: «لە خەڵک دەترسام و هیوای بەزەییم پێت بوو». پەروەردگار لێی دەبووری. ڕۆژێک پێغەمبەر فەرمووی: «گەر ئەوەی من دەیزانم ئەنگۆ دەتانزانی، کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان و رووتان لە چۆڵ دەناو خۆتان دەڕنی و دەگریان».

جوبرەییل هات و گوتی: «پەروەردگار دەڵێ: بۆچی بەندەکانم لە بەزییم ناهومێد دەکەی؟» پاشان هاتە دەرو خەڵکی بە بەزەیی و هێژایی و دەهندەیی و دلۆڤانی خودا هیوادار کرد.

پەروەردگار وەحی ناردە سەر داوود و گوتی: «لە دڵ خەڵکیدا خۆشەویستم کە». گوتی: «چۆنت خۆشەویست کەم؟» فەرمووی: «بەزەیی و دلۆڤانی و دەهندەیی من بخەرە بیریان، چونکە بێجگە چاکە چیتریان لە من نەدیوە».

یەحیای کوڕی ئەسەمیان لە خەودا بینی، گوتیان: «پەروەردگار چی لەگەڵ کردی؟» گوتی: «لە وێستگەی پرسینەوەدا رایگرتم و گوتی: "ئەی شێخ! واو وات کرد". ترسێکی مەزن دایگرتم. پاشان گوتم: "پەروەرندەم! هەواڵی تۆیان وابە ئێمەدا"؛ فەرمووی: "چۆنیان هەواڵ پێ دان؟" گوتم: "عەبدولڕەزاق گوتی زەهری گوتوویە، ئەنەس لە پێغەمبەری بیستووە کە جوبرەییل بە پێغەمبەری گوتووە کە خودا گوتوویە دەگەڵ بەندەم وا دەکەم کە خۆی دەیەوێ و خۆی پێی وایە و چاوەڕوانی لێم دەکا، منیش چاوەڕوانی بەزەییت بوم". فەرمووی: "راستی گوت زەهری و راستی گوت پێغەمبەری من و راستی گوت جوبرەییل، من رەحمت پێ دەکەم". پاشان خەلاتیان کردم وخزمەتکارانی بەهەشت لە پێشمدا دەڕۆیشتن. شادییەکی زۆر سەیرم دی کە قەد نەمدیبوو"».

لە خەبەردا هاتووە کە یەکێک لە بەنی ئیسراییل خەڵکی لە بەزەیی خودا ناهومێد دەکردو تەنگی پێ هەڵچنیبوون. ڕۆژی پەسلان خودا پێی گوت، ئەمڕۆ وا لە بەزەیی خۆمت ناهومێد دەکەم کە تۆ بەندەکانمت هیوا بڕاو کرد.

لە خەبەردا هاتووە کە کابرایەک هەزار ساڵ لە دۆژەهدا دەبێ، هاوار دەکا: «ئەی دلۆڤان! ئەی

دەهندە!» پەروەردگار بە جبریل دەڵێ: «بڕۆ و ئەو بەندەمە بێنە». کە دەیهێنێ پێی دەڵێ: «جێگات لە دۆژەهدا چۆنە؟» کابر دەڵێ: «خراپترینی شوێنەکان». دەفەرمێ: «بیگێڕنەوە بۆ دۆژەهـ». کە دەیبەنەوە، رووی وەردەگێڕێ، پەروەردگار گاسی دەکاو دەڵێ: «بۆ ئاوڕت دایەوە؟» دەڵێ: «پەروەردندەم! قەد پێم وانەبوو کە لە دۆژەهم دەربێنی، دیسان بمگێڕیتەوە». خوداش دەڵێ: «بیبەن بۆ بەهەشت». بەم بۆچوونە و بەم گومانە دەرباز بوو.

## راستە قینەی هیوا

بزانە، ئەوەی چاوەڕوانی چاکە لە داهاتوو بکا، بەم چاوەنوارییە دەڵێن هیواو رەنگە داخوازیشی پێ بڵێن، یاخۆ رەنگە پێی بڵێن خاپێنراوی و گێلی و گەوجی. گەوج و نەزان ئەمانە لێک جیا ناکەنەوەو پێیان وایە هەموو ئەمانە هیوان و تەنانەت هیوای پەسند کراون، کەچی واش نییە. بەڵکوو گەر کەسێک توویەکی چاک بچێنێتە نێو خاکێکی نەرم و لەبار و ئەو خاکە لە هەرزەگیا بژارکاو لە بەردو دڕکی پاقژ کاو لە کاتی خۆیدا ئاودێری کاو چاوەڕوان بێ بەری چاک بگرێ و پەروەردگار لە سەرماو سۆڵەو تەرزەی بپارێزێ، ئەم چاوەنوارییە پێ دەڵێن هیوا. بەڵام گەر تووی کرم خواردوو بچێنێتە نێو خاکی بژارنەکراوی پڕ لە بەردو دڕک و لە کاتی خۆیا ئاوی پێ نەدا، کەچی هیوادار بێ بەری چاکیش بگرێ، ئەمە نەک هیوا، بەڵکوو گێلی و نەزانی و رێ لێ تێکچوونە. بەڵام گەر تووی چاک بچێنێ و زەوی لە بەرد و زیخ و دڕک بژارکا، کەچی ئاوی نەداو هیوادار بێ رەشیشی[1] بە سەردا بباری، ئەویش لە شوێنێ کە زۆر باران بارین باو نەبێ، هەرچەند زۆریش دوور نەبێ، ئەمە پێی دەڵێن داخواز. هەروەها ئەوەی تووی بڕوا لە دڵ دەچێنێ و لە ئاکاری خراپی بژار دەکاو بە ئاوی عیبادەت، ئاودێری دەکاو تا سەرەمەرگ هەروا دەژی و هیوای هەیە کە پەروەرندەی لە زیانی بپارێزێ و بڕوای دروست بمێنێتەوە، بەمە دەڵێن هیوا. نیشانەکەشی ئەوەیە کە لە داهاتوودا کەمتەرخەم نەبێ و لە بڕیاری کلا نەبێ وکورتی نەکا؛ چونکە وازهێنان و گوێنەدان بە بڕیار، لە سۆنگەی ناهومێدییەوەیە نەک هیواداری. بەڵام ئەوەی تووی باوەڕی کرم خورادبێتی، چونکە تەواو ئارخەیان نییە، یان تووی بڕوای چاک بێ، بەڵام مەزرای دڵی لە هەرزەگیاو لە دڕک و داڵی ئاکاری خوار بژار نەکاو لە کاتی خۆیدا بە ئاوی عیبادەتی تێرئاو نەکا و هیوادار بێ پڕبەریش بێ و بەزەیی و دڵوڤانی خودای بەرکەوێ، ئەوە گێلییە، نەک هیوا. هەروەک پێغەمبەر گوتی: «الأحمَقُ مَنِ اتبَعَ نَفسَهُ هَواها وَ تَمنّى عَلَى الله -عَزوَّجَّل- الأماني». واتە: نەفام ئەوەیە کە رەدووی ئارەزووی نەفسی کەوێ و چاوەڕوانی بەزەیشی بێ؛ بەڵکوو

---

[1] - رەشیش: نەرمە باران.

پەروەردگار فەرمووی: فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٞ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا[1]. لۆمەی ئەوانەی دەکا کە میراتی زانستی پێغەمبەرانیان پیشگەیشتووەو کەچی پەرژاونەتە سەردونیا و دەڵێن چاوەڕوانین خودا بەزەیی پێماندا بێتەوە. کەواتە، هەرشتێک هۆکارەکانی لە دەستی مرۆڤدایەو بەتەواوی جێبەجێی کردووە، بەرهەمی ئەو چاوەڕوانیە، هیوای پێ دەڵێن؛ کە هۆکارەکانی تێکدا، بەرهەمی ئەو چاوەڕوانیە گێلی و نەزانی و لاڕێییە؛ گەر نە کاول بێ و نە ئاوەدان، بەرهەمی ئەو چاوەڕوانیە ئارەزووی پێ دەڵێن. پێغەمبەر فەرمووی: «لَيسَ الدِّينُ بِالتَّمَنِّى»؛ واتە: کاری دین بە ئاوات و ئارەزوو پێک نایە. کەواتە هەرکەس لە هەڵەو پەڵە پاشگەز بوو، دەبێ هیواداربێ کە وەردەگیرێ؛ ئەوەش نەگەڕایەوە، کەچی بە هۆی گوناحەکانیەوە خەمین و لێوبەبارەو هیوادارە پەروەردگار ببووری، ئەمە هیوایە، چونکە ئەو خەمبارییەو ئەو پەژیوانییە ڕێگەی پاشگەزبوونەوەی بۆ ئاوەڵا دەکا؛ بەڵام ئەوەی خەمین نەبێ و چاوەڕوانی تەوبە کا، ئەوە ڕێگای لێ تێکچووە؛ گەر بەبێ پاشگەزبوونەوە هیوای لێبوردنی بێ، ئەمەش هەر ڕێگا لێ تێکچوونە، هەرچەن بەمانە دەڵێن گەوجانی هیوادار. پەروەردگار دەڵێ: إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ[2]؛ واتە: ئەوانەی بروایان هێناو چشیان لە شار و ماڵ و ژینیان کرد و دەربەدەرییان هەڵبژارد و دەگەڵ کافران خەزایان کرد ئەمانە دەبێ هیواداربن بە ڕەحمەتی پەروەردگار.

یەحیای مەعاز دەڵێ:«هیچ گەوجییەک پتر لەوە نییە کە کەسێک تووی ئاور بچێنێ و چاوەڕوانی بەهەشت بێ و کاری گوناحکاران بکاو بە دووی خانووی فەرمانبەرداندا بگەڕێ و تامازرۆی پاداشی کاری نەکردوو بێ».

کابرایەک بوو بە ناوی «زیدالخیل»، لە پێغەمبەری پرسی: «هاتووم لێت بپرسم کە نیشانەی ئەمەی کە پەروەردگار خێری بۆ کەسێک ویستووە چییەو نیشانەی ئەوەی کە خێری بۆ نەویستووە چییە؟» فەرمووی: «بەیانیان کە لە خەو ڕادەبی چت لەدڵایە؟» گوتی: «وام کە چاکەو چاکەکارانم خۆش دەوێ. کە چاکەیەکم بۆ دەس بدا، خێرا دەیکەم و لە پاداشەکەی دڵنیام، گەریش نەتوانم بیکەم خەم دامدەگرێ و بە بۆنەی فەوتانی ئەو هەلەوە خەمین دەبم». فەرمووی: «ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە چاکەی بۆت ویستووە، بەڵام گەر کارێکی تری بۆت بویستایە، دەتیپەڕژاندە سەر کارێکی تر

---

١ - (قورئان ١٦٩/٧)

٢ - قورئان ٢١٨/٢.

و هیچ خەمت نەبوو کە لە کام سارا، لە ساراکانی دونیا ژینت دوایی دێ و بە خەسار دەچی».

## دەرمانی هیوا بە دەستهێنان

بزانە، ئەم دەرمانە تەنیا بۆ دوو نەخۆش دەنوێندرێ: **یەکەم** ئەو کەسەی کە نوقمی گوناح بووە و پاشگەزنابێ و دەڵێ پەروەرندەم لێم نابوورێ و **ئەویتریان** ئەو کەسەیان کە لەبەر عیبادەت و پەرستنی زۆر خۆی دەکوژێ و ئازاری زۆر دەداتە خۆو پتر لە توانی خۆی عیبادەت دەکا. ئەم دوو نەخۆشە گەلێک پێویستیان بەم دەرمانەیە. بەلام نائاگایان ئەم دەرمانە بۆیان لە ژار کوشندەترە.

هیوا دوو ئەنجامی هەیە:

**یەکەم**، پەند وەرگرتنە؛ کە بیر کاتەوە لە سەیرو سەمەرەکانی دونیاو چەندوچوونی ئافراندنی روەک و ئاژەڵ و نیعمەتەکانیتر. هەر بەو چەشنەی بەرلە ئێستا لە بەشی شوکرانەدا هاتە گوتن. تا بەزەیی و سەرنج و رەحمەتێک ببینێ کە سەرتر لەوە چیدی نەبێ. یان کە سەیری خۆی کا کە نیازەکانیان چۆن ئافراندووە، تەنانەت ئەوەی نیاز بێ وەکوو سەر ودڵ، یان پێویست بێ وەکوو دەست و پێ، یان بۆ جوانی بێ وەکوو سووری لێوو کەچی برۆ و رەشی و راستی برژانگی چۆن ئافراندووە. ئەم رەحمەتەی بەهەموو گیانداران کردووە؛ تەنانەت گەلێک جوانکاری ورد و ناسکی لە ئافراندنی مێش هەنگویندا داناوە، وەکوو بیچم و ئەندامی جوانی، رێنومایی بۆ بنیات نانی ماڵی، کە هەنگوینی تێدا کۆوە دەکاو گوێڕایەڵی شاهەنگە و ماکیان[1] چۆن رایان دەگرێ و حوکمیان بە سەردا دەدا. ئەوەی لە سەیرو سەمەرەکانی ئافراندنی خۆی و گیاندارانیتر رامێنێ، دلۆڤانی و بەزەییەک دەبینێ کە جێگا بە هیچ ناهومێدی وترسێک ناهێڵێ؛ یان دەگەڵ ترس بەرانبەریان دەبینێ؛ تەنانەت بۆی هەیە هیوا لە دڵدا فرەتر لە ترس بێ. ئاسەواری بەزەیی و دلۆڤانی خودا لە ئافراندنی خۆماندا، دوایی نایە. تەنانەت یەکێک لە گەورەکان دەڵێ هیچ ئایەتێ لە قورئاندا هیوادەرتر لە ئایەتی قەرزدان و قەرزگرتن نییە[2]، چونکە پەروەردگار درێژترین ئایەی قورئانی بۆ ئەوە ناردووە تا ماڵی ئێمە رابگرێ کە نەفەوتێ کاتێ بە قەرزی دەدەین. جا چۆن دەبێ ئەوەی ئەم هەموو بەزەییەی هەیە. لە بووردنمان خۆی لابداو بمانخاتە نێو دۆژهەوە. ئەمە رێگایەکە بۆ گەیشتن بە هیوا و گەلێک مەزنە و هەرکەس ناگاتە ئەم ئاستە.

**دووەم**، رامان و تێفکرینە لە نێو ئایەو خەبەری هیوادا، ئەمەش لەرادەبەدەرە. هەروەک لە قورئاندا

---

[1] - ماک: شاهەنگ، مەلەکەی هەنگ.

[2] - قورئان ٢/٢٨٢.

دەڵێ کەس لە بەزەیی من ناهومێدنەبێ. لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ[1]. فریشتەکان تکای بەخشین بۆ خەڵکی سەرزەمین دەکەن: وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي ٱلْأَرْضِ[2]، دۆژەهـ بۆ راگرتنی کافرانە، بەلام ئێوەی پێ دەرەنجێنێ و دەتانترسێنێ: ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ[3]. پێغەمبەر شەو و رۆژ لە تکاکاری نەتەوەکەی هەدای نەدەدا تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ[4] گەرچی مەردم ستەمکاربن و ستەم لە خۆیان کەن، پەروەرندەت بەخشندەیە. کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوار: وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ[5]؛ واتە: بەم زوانەش پەروەرندەت چاکەی وەهات دەگەڵ دەکا تا رەزا بی؛ گوتی: «محەممەد رازی نەبێ تا یەک کەس لە ئوممەتەکەی لە دۆژهدا بێ». ئایەی وا گەلێک زۆرن.

## لە خبار

پێغەمبەر فەرمووی:« ئوممەتی من بەخشراون و بەزەیی خودایان بەرکەوتووە، لە دونیادا سزا دەردێن بە ئاژاوەو بوومەلەرزە. رۆژی پەسلان بە هەریەکیان کافرێک دەدەن و دەڵێن: «ئەمە لە دۆژەهدا دەکرێتە فیدای تۆ». دیسان گوتی: «یاووتا هی ئازاری دۆژەهەو بەشی بڕوادار لە دۆژەهـ هەر ئەوەیە».

ئەنەس دەڵێ پێغەمبەر گوتی: «پەروەرێنەرم! پێڕاگەیشتن بە ئوممەتەکەم بە من بسپێرە با کەس خراپییەکانیان نەبینێ». فەرمووی: «ئەمانە ئوممەتی تۆن و بەندەی منن، بەزەیی من بۆیان پتر لە تۆوە، نامەوێ نەتۆ و نە کەسی دی، هەڵەو پەڵەیان ببینێ».

پەیغەمبەر دەیگوت: «ژینم خێری ئێوەی تێدایەو مردنیشم چاکەی ئێوەیە. گەر زیندوو بم شەریعەتتان پێ فێر دەکەم، کە مردم، کردەکانتان پێم دەنوێنن. ئەوەیان چاک بێ، سپاسی خودا دەکەم، ئەوەشیان خراپ بێ داوای لێبوردنی دەکەم». جارێک پێغەمبەرگوتی: «یا کریم! العفو!» جبریل گوتی: «دەزانی واتای ئەمە چییە؟ ئەوەیە کە خراپەکان بسڕێتەوەو لەگەڵ چاکە بیانگۆڕێتەوە».

---

١ - (قورئان ٥٣/٣٩) نابێ ئێوە لە بەزەیی خوا ناهومێد بن. (هـ)

٢ - (قورئان ٥/٤٢) داوای بەخشین بۆ خەڵکی سەرزەمین دەکەن. (هـ)

٣- (قوئان ١٦/٣٩) خودا بەمە عەبدانی خۆی دەترسێنێ. (هـ)

٤ - قورئان، ٦/١٣.

٥ - قوئان ٥/٩٣.

دیسان گوتی: «کە بەندە گوناح بکاو پاشان پاشگەز بێتەوە، پەروەردگار دەڵێ: «هۆ فریشتەکان! بروانن بەندەی من گوناحی کردو دەزانێ پەروەرێنەرێکی هەیە کە لێی ناگرێ و دەیبوورێ، ئێوە دەگرمە شایەت کە لێی بوردم».

دیسان فەرمووی: «پەروەردگاری مەزن دەڵێ: «گەر بەندەی من پڕ بە زەمین و ئاسمان گوناح کا، کاتێ داوای لێبوردن کا، دەیبوورم، چونکە هیوای پێم هەیە.» دیسان گوتی: «گەر بەندەم پڕ بەزەمین گوناحی بێ، من پڕ بە زەمین بەزەییم بۆی هەیە».

دیسان گوتی: «فریشتەکان تاشەش کاتژمێر گوناحی بەندە نانووسن؛ گەر تەوبەی کردو داوای لێبوردنی کرد، چجار نایاننووسن؛ گەر پاشگەز نەبووەوە بەڵام داوای لێبوردنی کرد و عیبادەتێکی کرد، فریشتەی دەستی راست بە ویتر دەڵێ ئەم گوناحەی لە دەفتەرت بسڕەوە تا منیش چاکەیەکی لە هەمبەردا بسڕمەوە. هەر چاکەیەک دە بەشە، نۆ بەشی بۆ دەمێنێتەوە».

دیسان فەرمووی: «کە بەندە گوناحی کرد، بۆی دەنووسن». عارەبێ گوتی: «گەر پاشگەز بێتەوە؟» گوتی:«بۆی دەسڕنەوە». گوتی: «گەر دیسان کردیەوە؟» گوتی: «بۆی دەنووسنەوە». گوتی: «گەر دیسان پاشگەز بێتەوە؟» فەرمووی: «دیسان بۆی دەسڕنەوە». گوتی: «تا کەنگێ؟» فەرمووی: «تا داوای لێبوردن کا. خودای مەزن لە بەخشینی بەندەکانی وەڕەس نابێ، تا بەندە لە تکای لێبوردن وەڕس نەبێ. کە تەمای چاکەی کرد، فریشتە بە چاکە بۆی دەنووسێ بەر لەوەی. بیکا. کە چاکەی کرد، بە دە چاکە بۆی دەنووسێ. پاشان پتری دەکا تا دەگاتە حەوتسەد؛ کە تەمای گوناحی کرد، بۆی نانووسێ، کە کردی بە یەک گوناح بۆی دەنووسێ و هیوا هەیە خودا بیبەخشێ».

پیاوێ بە پێغەمبەری گوت: «من مانگی رەمەزان رۆژوو دەگرم و پێنج فەرزی نوێژم دەخوێنم، بەڵام هیچی لێ زیاد ناکەم، زەکات نادەم و حەجیش ناکەم، چونکە هیچم نییە، لە پەسلاندا لە گەڵتم؟» پێغەمبەر زەردەیەکی کردو فەرمووی: «دەگەڵمی، گەر دڵ لە دوو شت بپارێزی: گزی و رژدی؛ زمانت لە دوو شت راگرە: درۆ و خوسپە؛ چاوت لە دوو شت بپارێزە: سەیرکردنی ژنی نامەحرەم و بە سووکی سەیری بەندەکانی خوداکردن؛ ئەوسا دەگەڵم بۆ نێو بەهەشت سەردەکەوی و وەکوو ناولەپم، لە لای خۆمت رادەگرم».

عارەبێ لە پێغەمبەری پرسی: «ئەی پێغەمبەری خودا! سبەینێ کێ بە حسێبی خەڵکی رادەگا؟» فەرمووی: «خودای مەزن». گوتی: «بۆ خۆی پێی رادەگا؟» فەرمووی: «ئەرێ، بۆ خۆی پێی رادەگا». کابرای عارەب پێکەنی. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوە پێکەنیت؟» گوتی: «ئەرێ، چونکە کە دلاوا هەڵەت ببینێ، دەتبوورێ. کە پێت رابگا، لێت ئاسان دەگرێ». فەرمووی: «راستت گوت، هیچ دلاوایەک لە پەروەردگار دلاواتر نییە». کابرا گوتی: «ئەم عارەبە زۆر زانایە». پێغەمبەر فەرمووی:

«پەروەرندەم کەعبەی زۆر هێزا و مەزن کردووە. بەلام گەر کەسێک بەرد لەبەردی کاتەوەو هەمووی کاول و خاپوور کا، گوناحی ناگاتە ئەو رادەی کە کەسێک بەسووکی سەیری دۆستانی خودا کا».
گوتی: «دۆستی خودا کێیە؟» فەرمووی: «سەرلەبەری باوەڕداران دۆستی خودان. نەبێتسووە دەلێ: ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ[1]».

فەرمووی: «پەروەرندەی مەزن دەلێ: «خەلکم بۆیە ئافراند تا قازانجم لێ ببەن، نەک قازانجیان لێ ببەم». دیسان فەرمووی: «پەروەردگار بەر لە ئافراندنی خەلکی لەمەڕ خۆی نووسیویە: "بەزەیی من بەسەر تووڕەییمدا زالە"». دیسان فەرمووی: «هەرکەس بە دلبێشی بلێ "لا اِلهَ الاّ اللّـه"، دەڕواتە بەهەشت؛ هەرکەس دوایین پەیڤێ کە دەیلێ هەرئەمە بێ، ئاور نایبینێ؛ ئەوەش بەبێ ئامبازدانان بۆ خودا بڕواتە جیهانی خامۆشان، ناڕواتە نێو ئاور». دیسان گوتی: «گەر ئێوە گوناحتان نەکردایە، پەروەردگار خەلکێکیتری دەخولقاند کە گوناح کەن، تا لێیان خۆش بێ و بیانبوورێ، چونکە خودا بەخشندەو دلۆڤانە». دیسان فەرمووی: «پەروەردگار زۆرتر لەوەی کە دایکێک کۆرپەی بەرمەمکی خۆش بوێ، بەندەکانی خۆش دەوێ». دیسان گوتی: «پەروەردگار لە رۆژی پەسلاندا ئەوەندە بەزەیی خۆی پیشان دەدا کە دلی کەس چجار ئەوەندە بەزەیی نەدیوە؛ تەنانەت شەیتانیش مل هەلدەبڕێ و هیوای بەزەیی بەرکەوتنی هەیە». فەرمووی: «خوای گەورە سەد بەزەیی و رەحمەتی هەیە: یەک رەحمەتی لەم دونیایە نواندووەو نەود و نۆی بۆ پەسلان داناوە. هەموو دلی ئەم دونیایە بەو یەک بەزەییە، دلۆڤانن، تەنانەت خۆشەویستی دایک بۆ مندال و چوارپێ وئاژەل بۆ مندالانیان، بەبۆنەی ئەو یەک بەزەییەوە هەیە. لە پەسلاندا ئەو بەزەییە لەگەل نەوەد و نۆیتر بەسەر خەلکدا رادەکێشێ، هەر بەزەییەک بە قەد زەوی و ئاسمانەکان. لەم رۆژەدا کەس زیان ناکاو بە خەسار ناڕوا، مەگەر ئەو کەسەی لە سەرەتاوە فەوتێنرابێ». دیسان فەرمووی: «تکاو شەفاعەتی خۆم لە لووتبەرزانی ئومەتم درێغ کردووەو رامگرتووە، پێتان وانەبێ بۆ گوێڕایەل و پارێزکارانم راگرتووە، بەلکوو بۆ ئەوانەی رموودەی گوناح دەبن رامگرتووە».

سەعدکوڕی بیلال گوتی: «رۆژی پەسلان دوو زەلام لە دۆژەهەوە دێنن. پەروەردگار دەلێ: "من ستەم لە کەس ناکەم، ئەوەی تووشی بوون بە بۆنەی خراپەکاری خۆتانەوە بوو". یەکێکیان بە کۆت و زنجیرەوە بە پەلە و هەلەداوان و ئەویتریان یەواشێک دەڕۆیشت. فەرمووی بیانگێڕنەوە. لەوەی کە بلەزوبەز رێگای دەبڕی، پرسی "بۆچی پەلەت بوو؟" گوتی: "ترسام؛ بەبۆنەی نافەرمانیوە ئەم بەلایەم تووش هات، کە فەرمانت دا نەموێرا راوەستم". لەویتر کە بە ئەسپایەک دەڕۆیشت پرسی؛ گوتی: "کە

---

[1] - (قورئان، ٢٥٧/٢) خودا یاری گەلی خاوەن باوڕانە و لەناو تاریکستانەوە دەیانبا بەرەو رووناکی. (هـ)

گاسـت کردینــە لای خــۆت. پـێم وابــوو دەمـانبووری و نامـان گێڕییــەوە بـۆ دۆزەهــ". بـەم بۆنــەوە هەردووکیانی ناردە بەهەشت».

پێغەمبەر فەرمووی: «ڕۆژی پەسلان دەنگێک دەڵێ: "ئەی ئوممەتی محەممــەد! مـن مـافی خــۆم پێتان بەخشی و لێتان بوردم، ئێستا مافی خۆتان بە سەرتانەوە ماوە. گەردنی یەک ئازادکـەن و بڕۆنــە نێـو بەهەشــت"». دیـسان گـوتی: «ڕۆژی پەسـلان یـەکێک لـە ئوممەتەکـەم دێـنن و نـووکوبـەدی کردەکانی لە نەوەد و نۆ نامیلکـەدا پێـی دەنـوێنن، بـە چەشـنێ کـە هـەموویان دەبینــێ و تـەواوی گوناحەکانی بە ڕاشکاوی سەیر دەکا. پەروەردگار پێـی دەڵــێ: "لەمانــە هیچیـان بـە نـاڕەوا دەزانی و فریشتەکان ستەمیان لێت کردووە؟" دەڵێ: "نە، پەروەرندەم". ئامادەی ڕۆیشتنە دۆزەە دەبــێ. خــودا دەڵێ: "چاکەیەکت لە لای من هەیەو ستەمت لێ ناکەم". لاپەڕەیەک دێنن کە لە ســەری نووســراوە: "اَشهَدُ اَن لااِلهَ الاّ الله وَ اَشهَدُ اَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله". پاشان بەندە دەڵێ: "ئەم پەڕە لـە هەمبــەر ئـەم هــەموو نامێکە، چ کەڵکی هەیە؟" خــوداش دەڵــێ: "کـەس ســتەمت لــێ ناکـا، ئـەو پەڕەیـە دەخرێتــە تــای کێشانەوەو گوناحەکانیشت دەخرێنــە ئـەو تـای‌تـرەوە، دەبـینی کـە ئـەو چاکـە هـەموو خراپـەکانت هەڵدەگرێ، چونکە هیچ شـت گـەورەترو گرانتــر و هێژاتـر لـە پەیـڤی تاکپەرسـتی نییـە"». دیـسان فەرمووی: «ڕۆژی پەسلان پەروەردگار بـە فریـشتەکانی دەڵــێ کـە هەرکـەس مـسقاڵێ خێـری لـە دڵدایە، لە دۆژەهی ببێننــە دەر. خەڵـکێکی زۆر دەهێننــە دەر و دەڵــێن لەمانــە کـەس نـەماوە لـە دۆژەهدا. دیسان دەڵێ ئەوەی نیو مـسقاڵ چاکـەی لـە دڵایـە بیهێننــە دەرەوە. خەڵـکێکی زۆر لـە جەحەندەم دێننەدەر. ئاور دەڵێ: "ئەمانە هەموویان هاتنــە دەر". دیـسان دەڵــێ: "ئـەوەی تۆزکاڵــێ چاکەی لە دڵدایە بیهێننە دەر". هەموویان دێننە دەرو دەڵێن ئەوەش کە تۆزکاڵێ چاکـەی لـە دڵـدا بوو، لە دۆژەهدا نەماوە. دەڵێ تکای فریشتەکان و پێغەمبـەران و بـڕواداران هــەمووی وەرام درایــەوەو هیچ نەماوە، تەنیا میهرەبانی پەروەردگار نەبێ. پاشان پەروەردگار بە قــەدەر مــستێک ڕۆح لـە دۆژەە دەردێنێ کـە قــەد چاکـەیان لـە دڵـدا نـەبووە، ئەمانـە وەکـوو ڕەژی ڕەش هەڵـگەڕاون. هـەموویان دەهاوێژنە نێو ڕووبارێ کە پێی دەڵێن چۆمی زین، کە لەوێ دێنە دەر، پاکژو ڕوون بوونەتـەوەو وەکـوو تەرزەگیایەک لە نێو چۆمدا ڕوابێ، دەدرەوشێتەوە و تیـشک دەپـرژێنن و هـەموو خەڵـکی بەهەشــت دەیانناسن و دەڵێن ئەمانە ئەوانەن کە پەروەردگار ڕزگاری کردوون، چ چاکەیـەکیان لـە دڵـدا نـەبوو. پێیان دەڵێن. وەرنە نێو بەهەشتەوە، هەرچیتان بـینی هــی خۆتانــە. دەڵــێن، خودایـا! ئـەوەی پێـت داوین بە هیچ بەهەشتییەکت نەداوە. دەڵێ. ئەنگۆ خەلاتی هێژاترتان لە لامە. دەڵێن: خوایـا! هێژاتـر لەمەچییە؟ دەڵێ: ئەوەی کە لێتـان خــۆش دەبم و چجـار لێتـان نـاخۆش نـابم». ئـەم خەبـەرە لـە سەحیحی بۆخاری و موسلیمدا هاتووە.

دەگێڕنەوە کە منداڵێکیان لە خەزایەکەدا بەدیل گرتبوو، لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا رایاننابوو کە بیفرۆشن. ژنێ لەژێر رەشدەوارێکدا ئەو کوڕەی بینی، بەهەڵەداوان و راکردن بەرەو کوڕە هەڵات، خەڵکی نێو ئەو دەوارەش بە دوویدا رایان دەکرد. ژنە، کوڕەی لە ئامێز گرت و بە سنگیدا نووساندی و لە ژێر سای خۆیدا رایگرت کە تاو لێی نەدا. گوتی ئەمە کوڕی منە. خەڵکی لەو هەمووە بەزەیی و دڵۆڤانیەی ئەو ژنە سەریان سووڕماو هەموو وازیان لە کار هێنا بوو و ئاپۆرەیان بەستبوو و بۆی دەگریان. پێغەمبەر لەوێ رادەبورد، راستی رووداویان بۆی گێڕایەوە، بەزەیی و دڵۆڤانی خەڵکەکەی پێ خۆش بوو، فەرمووی: «بەزەیی و میهرەبانی ئەم ژنەتان زۆر پێ سەیر بوو؟» گوتیان: «ئەرێ ئەی پێغەمبەری خودا!» فەرمووی: «پەروەردگار چەن ئەم ژنە منداڵەکەی خۆش دەوێ، پتر لەوە هەموو مرۆڤێکی خۆش دەوێ». پاشان موسوڵمانان بە شادییەکی لەڕادەبەدەر، لەوێ بڵاوەیان کرد.

ئیبراهیمی ئەدهەم دەڵێ: شەوێک لە تەوافدا تەنیا مامەوە. باران دایکرد. گوتم: «خوایا! لەگوناحم بپارێزە و تووشی هەڵەو پەڵە نەبم». دەنگێکم لە لای کەعبەوە کەوتە بەرگوێ کە گوتی: «تۆ بێگوناحیت دەوێ، بەندەکانی‌تریشم هەر ئەمەیان دەوێ، گەر هەموو پاک و بێ‌خەوش بن و لە گوناحیان بپارێزم، بەزەیی و دلۆڤانی خۆم بەسەر کێدا. ببارێنم؟» بزانە، لەم خەبەرانە گەلێک زۆرن و ئەوەی ترسی بەسەردا زاڵ بووبێ، ئەمە دەرمانیە. ئەوەش خافل و ناگاتایە، دەبێ بزانێ کە بەسەرینی ئەم هەموو لێبوردن و بەزەییەش، دیسان هەندێ بڕوادار مەنزڵگایان دەبێتە دۆژەهـ. دوایین کەسیش کە لە جەحەننەم دەرباز دەبێ، پاش حەوت هەزار ساڵە دێتەدەر. چونکە بووز دەخوا ئەم دواین کەسە هەریەک لە مەمانان بین، بۆیە دەبێ تێبکۆشین و خۆمان لە گوناح ببوێرین و ئاگاداری هەڵس و کەوتمان بین تا لەم تاقمە نەبین؛ چونکە هەموو چێژو خۆشیەکانی دونیا گەر لە تایەک دابنین و تەنیا یەک شەو ئازاری دۆژەهـ لە تایەکی‌تر، یەک شەوی دۆژەهـ قورسترە، چ بگا بە حەوت هەزار ساڵ.

بە کورتی دەبێ ترس و هیوا هاوسەنگ بن. هەروەک عومەر گوتی: «ئەگەر بڵێن سبەی کەس ناڕواتە بەهەشت بێجگە یەک کەس، پێم وایە ئەو یەک کەسە منم؛ گەریش بڵێن بەیانی بێجگە لە یەک کەس، کەس ناڕواتە نێو جەحەننەم ، پێم وایە ئەو یەک کەسە منم».

## شرۆڤەی راستەقینە و هێژایی ترس و جۆرەکانی

بزانە ترس پلە و مەقامێکی زۆر بەرزە و هێژاییەکەی شیاوی هۆکار و ئەنجامەکانیەتی:

**هۆکارەکانی** زانست و ناسینن و لە دواییدا بە وردی راڤە دەکرێن. بەم بۆنەوە خودا گوتی: ﴿ إِنَّمَا

یَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ.[1] پێغەمبەریش گوتی: «رأسُ الحكمَةِ مَخافَةُ اللهِ[2]».

**بەرهەمەکانیشی** پاکی و پارێزگاری و پاکژییە. ئەمانەش هەموو، تووی بەختەوەرین، چونکە بەبێ وازهێنان لە ئارەزووکانی نەفس و خۆڕاگرتن لەسەر ئەو وازهێنانە، ڕێگەی پەسلان خویان نابێ. هیچ شت وەکی ترس ئارەزووی نەفس ناسووتێنێ. بەم بۆنەوە پەروەردگار لەو کەسانەیدا کە لە خودا دەترسن، بەزەیی و زانست و لێبوردن و ڕێنواندنی کۆوە کردووە و سێ ئایەی قورئانی ناردووە کە دەڵێ: هُدًى وَرَحۡمَةٌ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ[3] ئەویتر: إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ، هەروەها فەرمووی: رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ[4]؛ پارێزگاری کە بەرهەمی ترسە، بە هی خۆی ناو لێ دەبا و دەڵێ: وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡ[5]

پێغەمبەر فەرمووی: «ئەو ڕۆژەی لە نووکوبەدی خەڵک لە سارای پەسلاندا ئاپۆرە دەبەستن، جارچییەک، بە دەنگێک کە لە دوور و نزیکەوە دەبیسرێ، بانگ دەکا و دەڵێ: "هۆ خەڵکینە! لەو ڕۆژەوە کە ئێوەم ئافراند، تاکوو ئەمڕۆ گوێم لە پەیڤ و ئاخاوتنتان گرت، تاکوو ئەمڕۆ گوێم لێ بگرن و کارەکانوو لە پێشوو رادەنێم؛ هۆ خەڵکینە! تۆرەمەیەک ئەنگۆ داتانناو تۆرەمەیەک من؛ تۆرەمەی خۆتان بەرز ڕاگرت و هی منتان دانا. گوتم: إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ[6] -هێژاترینتان لە لای پەروەردگار، پارێزکارترینتانە- ئێوە گوتتان گەورە، فلان کوڕی فلانە. ئەمڕۆ تۆرەمەی خۆم بەرز دەگرم و هی ئێوە دادەنێم. پارێزکاران لە کوێدەرن؟" دروشمێ هەڵدەگرەن و پارێزکاران دەکەونە دووی تا بێپرسینەوە بڕۆنە نێو بەهەشتەوە». بەم بۆنەوە لە خواترسان پاداشێکی زۆرتری هەیە و فەرمووی: وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ.[7] پێغەمبەر فەرمووی: «خودا دەفەرمێ کە "سوێند بە گەورەییم کە قەد دوو هێمنی و دوو ترس پێکڕا کۆوە ناکەم. هەرکەس لە دونیادا لێم بترسێ، لە دواڕۆژدا لە ئارامشدایە و گەر لە دونیا لێم دڵنیا بێ و لە ئارامشدا بێ، لە پەسلاندا، لە ترسدا رایدەگرم"». دیسان فەرمووی: «هەرکەس لە پەروەدگار بترسێ، هەموو تشتێ لێێ دەترسن، ئەوەش

---

١ ـ ( قورئان، ٢٨/٣٥) لەناو عەبدانی خودادا هەر ئەوانەن فرەزانان لێی دەترسن. (هـ)

٢ ـ ژیهاتی زانایی و هۆزانی، ترس لە خودایە.

٣ ـ (قورئان، ١٥٤/٧) کە تێیاندا رێ شاندان و بە بەزەیط بوو بۆ ئەوانەی خودبێ ترسن. (هـ)

٤ ـ (قورئان، ٧/٩٨) خودا لەوان رازی بووە و ئەوانیش لەخودا رازین. کێ لە خودای خۆی ترساوە، ئەمەی دەبێ. (هـ)

٥ - (قورئان، ٣٧/٢٢) تەنیا هەستی ترسوو لەخوایە بەو دەگا. (هـ)

٦ - (قورئان، ١٣/٤٩).

٧ ـ (قورئان، ٤٦/٥٥) بۆ هەرکسیش لە پەروەرندەی ترساوە، دوو باخ هەیە. (هـ)

لە پەروەردگار نەترسێ، خودا لە هەموو تشتی دەترسێنێ».
دیسان گوتی: «ژیرترینتان، ترسەنۆکترینتانە لە پەروەردگار». دیسان: «هیچ بڕواداری نییە کە لەبەر ترسی خوا، دڵۆپە ئەسرینێکی لە چاو دانەتکێتە سەر گۆنای، هەر چەند ئەو دڵۆپە بە قەدەر پەڕی مێشێ بێ و خودا رووی لە ئاور حەرام نەکا».
دیسان پەروەردگار فەرمووی: «کە مرۆڤ لەبەر ترسی خودا مووی لەشی راستەو بێ و بیر لە هەڵە و پەڵەی کاتەوە، پەروەرێنەری وەکوو داوەرینی گەڵا لە دار، گوناحەکانی دادەوەرێنێ». عایشە دەڵێ لە پێغەمبەرم پرسیار کرد کە: «کەس هەیە بەبێ‌پرسینەوە بڕواتە بەهەشت؟» فەرمووی: «هەیە؛ ئەوەی بیر لە گوناحەکانی کاتەوەو بە خۆدا بلەرزێ». پێغەمبەر فەرمووی: «هیچ دڵۆپێ لە لای خودا هێژاتر و خۆشەویستتر لە دڵۆپە فرمێسکێ یان تنۆکە خوێنی کە لەبەر ترسی خودا دابتکێ نییە». دیسان فەرمووی: «رۆژی پەسڵان حەوت کەس لە سای عەرشی خوادان، یەک لەو حەوت کەسە ئەوەیە کە لە تەنیایی خۆیدا بیر لە خودا بکاتەوەو رۆندکی لە چاو بەر بێتەوە». حەنزەلە دەڵێ: «لە لای پێغەمبەر بووین، مۆچیاری دەکردین، بە جۆرێ کە دڵمان هەژیاو فرمێسکمان لە چاو بەربۆوە. گەڕامەوە بۆ ماڵ، دەگەڵ خێزانم کەوتینە نێو باسی دونیا؛ پاشان گوتەی پێغەمبەرم کەوتەوە بیر و گریانەکەی خۆمم هاتەوە یاد، رامکردە دەرەوە و هاوارم دەکرد کە "ئاخ کە حەنزەلە بوو بە دوڕاز". ئەبووبەکرم بینی، هاتەبەرەوە و گوتی: "تۆ نەبوویتە دوڕوو". رۆیشتمە پەرای پێغەمبەر، گوتم: "حەنزەلە بۆتە دوڕاز". گوتی: "کَلا لم ینافق حَنضله- حەنزەلە نەبۆتە دووبین". باسەکەم بۆی گێڕایەوە، گوتی: "حەنزەلە! گەر بەو چەشنەی لەگەڵ منن بمێننەوە، فریشتەکان لەسەر رێ و لە نێو ماڵدا دەستتان بەگەرمی دەگووشن؛ بەڵام ئەی حەنزەلە! ناوە بە ناوەی تێ دەکەوێ"».

**ئاسار**

شبلی دەڵێ: «رۆژ نییە ترسم بە سەردا زاڵ بێ و دەرگایەک لە دەرگاکانی هۆزانیم بە سەردا ئاوەڵا نەبێ». یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێ: «گوناحی بڕوادار لە نێوان ترس لە سزاو هیوا بە لێبوردن وەکوو ڕێوییەکە لە دوڕی دوو شێردا». دیسان دەڵێ: «مرۆڤی بێ ئەنوا، گەر ئەوەندەی لە پارسەکی دەترسێ لە دۆژەەبترسایە، دەڕۆیشتە نێو بەهەشتەوە». گوتیان: «بەیانی کێ هێمنترە؟» گوتی: «ئەوەی ئەمڕۆ زۆرتر دەترسێ». یەکێک لە حەسەنی بەسری پرسی: «چ دەڵێی لەسەر کۆڕی کەسانێ کە ئەوەندە دەمانترسێنن، بەندی دڵمان دەبڕێ؟» گوتی: «ئەمڕۆ لەگەڵ کەسانێک بن کە بتانترسێنن و سبەینێ دەرباز بن، چاکترە لەوەی لەگەڵ کەسانێ دابنیشن کە ئەمڕۆ هێورتان کەن و بەیانی تووشی ترس بن». ئەبووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «هیچ دڵ نییە کە لە ترس خاڵی بوو و کاول

نەبوو». عایشە گوتی: «بە پێغەمبەرم گوت: "ئەوەی کە لە قورئاندا دەڵێ دەیکەن و دەترسن -يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ [1]- دزی و زینایە؟" فەرمووی: "نە؛ ئەوە نوێژو ڕۆژوو و چاکەکردنە، کە دەترسن لێیان وەرنەگرن"». محەممەدی مونکەدیر کاتێ دەگریا، ئەسرینەکانی بە روویدا دەماڵی و دەیگوت: «بیستوومە کە هەر شوێنێ ئەسرینی پێ بگا، چجار ناسووتێ». سددیق دەیگوت: «بگرین، گەر پێتان نەکرا خۆ بهێننە گریان». کەعبی ئەحبار دەڵێ: «سوێند بە خودا! پێم خۆشە ئەوەندە بگریم کە ئاوم بە روودا داچۆڕێ، تا ئەوەی کە بە قەدەر کێوی زێڕ بدەمە هەژاران». عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەڵێ: «تنوکێ فرمێسک کە لە ترسی خوا بتکێ، پێم خۆشترە تا ئەوەی کە هەزار دینار بە خێر بدەم».

## راستە قینەی ترس

بزانە ترس دۆخێکە لە دۆخەکانی دڵ، ئاوری ژانێکە کە لە دڵدا دێتەدی. ئەوەش هۆ و بەرهەمێکی هەیە.

**هۆکەی** زانین و تێگەیشتنە، بەوەی کە مەترسی کاری دوارۆژ دەبینێ و هۆی فەوتانی خۆی ئامادەو تەیار دەبینێ. کە ئەمەی زانی ئاوری ژانی لە دڵدا پێ دەبێ و لەم سۆنگەوە دوو زانیاری بۆ دێتە دی:

**یەکەم** ئەوەی کە خۆی و کەمایەسییەکانی و زیانی عیبادەتەکانی و کرێتی ئاکاری خۆی بە راشکاوی دەبینێ و بەم کەمایەسییانەوە کە هەیەتی، تێدەگا کە پەروەرندەی چەندە بەزەیی بۆ هەیە. ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە پادشایەک خەڵاتێکی زۆری دەکا و چاکەیەکی زۆری دەگەڵ دەکا. کەچی ئەم لە حەرەم و خەزانەی پادشا خەیانەت دەکاو تێدەگا کە پادشا هەموو ئەو خەیانەتەی دیوەو دەزانێ کە پادشا بە غیرەت و تۆڵە ئەستێن و جوامێر و بوێرە و هیچ تکا کارێک کە شفاو لاڵەی بۆبکا و شەفاعەتی بخوازێ، لە لای شک نابا؛ بێشک ئاوری ترس و ژانی لە دڵ پێ دەبێ.

زانینی **دووەم**، لە ناسینی بوێری و دەسەڵاتی ئەوەوە دێ کە لێی دەترسێ؛ هەروەک ئەوەی کەسێک تووشی هاتبێتە تووش شێرێکەوەو زۆر بترسێ؛ جا نەک لە گوناحی خۆی، بەڵکوو لەوەی کە بزانێ شێر دڕندە و کوشندەیە و هیچ گوێ ناداتە کزی و لاوازی ئەم و لە هیچ شتیش ترسی نییە. ئەم ترسەش تەواوتر و هێژاترە. ئەوەش دانستەکانی پەروەردگاری ناسی و گەورەیی و توانایی و بوێری وی ناسی، چادەزانێ کە گەر نووکوبەدی ئافرێندراوانی بهاوێژێتە دۆژەەو بۆ هەتاهەتایان

---

[1] ـ (قورئان، ٢٣/٦٠) ئەوانە کە هەرچی لە وزەیاندایە دەیدەن؛ کەچی لە ترسی گەڕانەوەیان بۆ لای پەروەرێنەریان هەر دڵەڕاوکێیانە.

ڕاگرێ، تۆزکاڵێ لە دەسەڵاتی کەم نابێتەوە. بۆیە دەبێ لێی بترسێ. پێغەمبەرانیش ئەم ترسەیان هەیە هەرچەند دەزانن لە گوناح بەدوورن. ئەوەی زۆرتر خودای مەزن بناسێ، پتر لێی دەترسێ. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «من لە هەمووتان زۆرتر پەروەردگار دەناسم و زۆرتر لە هەمووشتان لێی دەترسم». هەروەها بۆیە گوتی: إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟[1] ئەوەش نەزانتر بێ، نەترسترە. وەحی هاتە سەر داوود کە: «ئەی داوود! وا لێم بترسە کە لە شێرێکی دڕندە و تووڕە دەترسی». ئەمە بوو هۆی ترس.

بەڵام **بەرهەمی ترس**، لە دڵ و لەش و ئەندامانداپە:

**لە دڵدا**، شاوەتەکان ناخۆش دەکاو چێژی شاوەتی لێ دەکاتە ژان؛ چونکە گەر کەسێک ئارەزووی ژن یان خواردنێکی بێ، کە کەوتە داوی شێرێک، یان بە دەست سوڵتانێکی تووڕەوە دیل کرا، ناوێرێ توخنی شاوەتی کەوێ؛ ئەوەی ترسی بە سەردا زاڵ بێ، هەموو گیانی دەبێتە خۆبەکەمگری و لارەملی و چاودێری و ڕاگەیشتن بەسەر کردەوەکانیدا و بیرکردنەوە لە دوارۆژ؛ نە لووتبەرزی دەمێنێ و نەڕژدی و نەخولیای دونیا و نە نائاگایی.

بەرهەمی ترس بۆ **لەش**، شکانەوە و زەردی و زارییە.

ئەنجامی لە **ئەندامانددا**، لە گوناحیان دەپارێزێ و بە ڕێز و حورمەتەوە عیبادەتیان پێ دەکا.

ئاستەکانی ترس جۆراوجۆرن: گەر لە ئارەزووەکانی نەفسی بیپارێزێ، داوێنپاکی پێ دەڵێن؛ گەر لە حەرامی بپارێزێ پارسایی پێ دەڵێن؛ گەر لە هەرچی لێلییە بیپارێزێ، یان لە هەر حەڵاڵێک کە ترسی حەرامی لێ بێ دووری کاتەوە، پارێزکاری پێدەڵێن؛ گەر لە هەرچی توێشووی دوارۆژ نییە بیپارێزێ، ڕاستی پێدەڵێن و بەو کەسەش دەڵێن ڕاسبێژ. داوێنپاکی و پارسایی خوارتر لە پارێزکارین. هەمووی ئەمانەش خوارتر لە ڕاستین. ئەمە ڕاستەقینەی ترسە.

بەڵام ئەوەی ئەسرینی دەبارێنێ و خێرا دەیسڕێتەوە و دەڵێ: «لا حَولَ وَ لا قُوَةَ الاّ باللهِ» و دەگەڕێتەوە سەر گوناحکردن، ئەمە دڵناسکی ژنانەی پێ دەڵێن. ئەمە ترس نییە، چونکە هەرکەس لە شتێک بترسێ، لەبەری هەڵدێ. ئەوەی شتێکی لە قۆڵدا بێ و کە بڕوانێ و مارێک ببینێ، قەد بە گوتنی: «لا حول» واز ناهێنێ و بە پەلەپەل دایدەخا. بە «زوننوون»یان گوت: «بەندەی لەخواترس کێیە؟» گوتی: «ئەوەی خۆی بە نەخۆشێک بچوێنێ کە لە ترسی مردن لە شاوەتەکانی خۆی دەبوێرێ».

---

١ ـ قورئان (٢٨/٣٥). لە ناو عەبدانی خودا دا هەر ئەوانەی فرەزانان لێی دەترسن. (هـ)

## ئاستەکانی ترس

بزانە ترس سێ ئاستی هەیە: لاواز و بەهێز و ناونجی. چاترینیان ناونجییە. لاواز ئەوەیە کە نەیخاتە سەر هێڵی راست، وەکوو دڵناسکی ژنان. بەهێز ئەوەیە کە بۆی هەبێ تووشی ناهومێدی بێ و ترسی نەخۆشی و بێهۆشی و مردنی هەیە. هەردووی ئەمانە دزێو و کرێتن؛ چونکە ترس لە خۆیدا وەکوو تاکپەرستی و زانین و خۆشەویستی، کەماڵ و تەواوبوون نییە؛ چونکە لە نێو تایبەتمەندییەکانی خوادا نییە. ترس دەگەڵ نەزانی و ناتوانی هاوڕێیە؛ چونکە تا کەسێک دوارۆژی لێ بەرپیوار نەبێ و ناتوانی خەلسین لە مەترسی نەبێ، ناترسێ. بەڵام ترس هۆی تەواوتربوونە بۆ نائاگایان؛ چونکە وەکوو قەمچییە کە منداڵان بۆ فێربوون دادەنێ و چوار پێ بۆ باربردن رادەگرێ. بەڵام کە زۆر بێهێز بوو و هیچ دەردێکی پێ دەرمان نەبوو، نە منداڵ دادەنێ و نەش چوارپێ رادەگرێ؛ گەریش زۆر بەهێز بێ، منداڵ یان چوار پێی بریندار دەکا، یان دەست و پێی دەشکێنێ، هەردووی ئەمانە بە کەڵک نایەن؛ بەڵکوو دەبێ ناونجی بێ تا بەرگری لە گوناح بکا و بۆ عیبادەت دنە بدا. هەرکەس زاناتر بێ، ترسەکەی ناونجیترە؛ چونکە کە زۆر بوو هیوای لێ دەبڕێ و کە کەم بوو زۆر بوێر دەبێ و ئاوڕ لە مەترسی رێگا ناداتەوە. ئەوەی نەترسێ و خۆ بەزاناش بزانێ، لە راستیدا ئەوە زانست نییە کە فێری بووە، بەڵکوو قسەی پڕوپووچە. وەکوو فالگری نێو بازاڕ کە خۆی بە هۆزان دەزانێ و هیچیش لە هۆزانی تێنەگەیشتووە. چونکە سەرەتا هەموو زانستێ ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی و خودای خۆی بناسێ: بزانێ کە خۆی تەژی کە هەڵەوپەڵەیە و پەروەردگار گەورەو مەزن و دەسەڵاتدارە و گەریش دونیا بفەوتێنێ، کەس ناتوانێ دەروستی بێ. ئەم دوو ناسینەش بێجگە لە ترس لە نێو دڵدا پێک ناهێنێ. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «أوّلُ العلمِ مَعرفَةُ الجَبَّار وَ آخرُ العِلمِ تَفويض الامر اليه»؛ واتە: سەرەتای زانست ئەوەیە کە بزانی خودا پادشایەکی تووڕە و دەسەڵاتدارە و ئەنجامی زانست ئەوەیە کە کارەکانت بەو بسپێری و چا بزانی کە هیچت لە دەستدا نییە و هیچت لە دەس نایە. جا چۆن دەبێ کەسێک ئەمە بزانێ و نەترسێ.

## شرۆڤەی جۆرەکانی ترس لە خودا

بزانە، ترس لە ناسینی مەترسییەوە دێتەدی و هەرکەسەش مەترسییەکی لە پێشدایە: کەس هەیە دۆژەهی پێ دەنوێندرێ و لەوە دەترسێ؛ کەسیش هەیە کە ئەو شتەی لە رێی دۆژەهدایە، پێی پیشان دەدرێ، هەروەک بترسێ کە پێش پاشگەزبوونەوە لە گوناح بمرێ، یان دیسان تووشیاری گوناح بێتەوە، یاخۆ لە دڵیدا توندی و تووڕەیی بێتە دی، یان خووی جاران بیباتەوە لای گوناح، یان

بە بۆنەی نیعمەتی زۆرەوە لە خۆبایی بێ، یا لە پەسلاندا ستەمێ کە لە خەڵکی کردووە، پێسیری بگرێ، یان خراپەکانی ئاشکرا بێ و ئاوڕووی بتکێ، یان بترسێ کە تشتێکی سهێتی بە دڵدا تێپەڕێ و خوداش پێی بزانێ و پیێ ناخۆش بێ. قازانجی هەر یەک لەمانە ئەوەیە کە دەپەرژێتە سەر ئەوانەی کە لێیان دەترسێ: گەر ترسی لە خووی خراپ بێ -کە دەیگێڕێتەوە بۆلای گوناح- لە خووە خراپەکانی لادەدا؛ گەر لە روانینی پەروەردگار بترسێ، دڵی پاکژ دەکا. هەروەها ئەوەی کە پتر لە هەموو شت بەسەر دڵی لەخواترسدا زاڵ دەبێ، بیری ئەنجامی ژینە، کە نەکوا بە دڵی بێبڕواوە بمرێ.

تەواوتر لەمەش ترس لە دواڕۆژە، کە لە ئەزەلدا چییان لەسەر بەختەوەری و چارەڕەشی لە چارەیدا نووسیوە؛ چونکە ئەنجام، لق و پۆی ئەو شتەیە کە لە ئەزەلدا نووسراوە. بنەمای ئەمە ئەوەیە کە پێغەمبەر لەسەر مینبەردا فەرمووی: «پەروەردگاری مەزن کتێبێکی نووسیوە کە ناوی خەڵکی بەهەشتی تێدایە» و پاشان دەستی راستی هەڵبڕی و گوتی: «کتێبکیتری نووسیوە و رەگەز و ناو و نیشانی خەڵکی دۆژەهی تێدا نووسیون» و دەستی چەپی هەڵبڕی؛ دیسان فەرمووی: «لەمە کەم ناکاتەوە و لەوەش زیاد ناکا. زۆر خەڵک هەیە کە لەسەر ریێ چارەڕەشیدایە و خەڵک بە زیانکاری دەزانن، کەچی گەر یەک رۆژ لە تەمەنی مابێ، خودا لەو رێگە لارەی دەگێڕێتەوەو لەسەر هێڵی راستی دادەنێ و بەختەوەر دەبێ. بەختەوەر ئەو کەسەیە کە رۆژی ئەزەل، بەختەوەری لە چارەیدا نووسراوە و چارەڕەش ئەوەیە کە لە ئەزەلدا بۆی رەچاوکراوە. بەم بۆنەوە کار لە دواییدا ئاشکرا دەبێ». ترسی رووناکدڵان لەمەیەو ئەمەش تەواوترە؛ هەروەکوو چۆن ترس لە خودا لەبەر گەورەیی خوا، تەواوترە لە ترس بە بۆنەی هەڵە و پەلەوە. چونکە ئەو ترسە هەموو دەم هەیەو نافەوتێ؛ بەڵام گەر لە گوناح بترسێ، رەنگە تووشی لووتبەرزی بێ و بڵێ لە گوناح وازم هێناوە، بۆچی بترسم؟

بەکورتی هەرکەس دەزانێ کە پێغەمبەر لە بەرزترین ئاستی بەهەشتدایەو بووجەهل لە خوارترین شوێنی جەحەننەم، کەچی هەردوویان بەر لە ئافراندن و هاتنە نێو دونیا، نە چاکەیەکیان بوو و نە خراپەیەک. کە ئافرێندران، رێگای بەندەگی و عیبادەت و زانیاری پێغەمبەریان خۆش کرد، بەبێ هیچ هۆیەک لە لایەن خۆیەوە، ویست و تامازرۆیی پێغەمبەریان لەسەر ئەم رێبازە دانا و نەیدەتوانی لەسەر ئەو شتەی بۆی خویان کراوە و پەردەی لە روو لادراوەو پیێ نوێندراوە، چاوی داخا و نەیدەتوانی کە ئەو شتەی ژاری کوشندەیە بخواتەوە. بووجەهل چونکە چاوی دڵیان کوێر کرد، نەیدەتوانی هیچ رۆناکیەک ببینێ؛ چونکە نەیدی، نەیدەتوانی واز لە شاوەتەکانی بێنێ؛ بەبێهۆ، دەستووری گوناح و غاردان لەسەر هێڵی لاریان پێدا تا بە دۆژەەگەیاندیان. کەچی پێغەمبەریان لەسەر هێڵی راست دەبرد، تا گەیشتە بەرزترینی بەرزترینەکانی بەهەشت. ئەوەی کە هەرچی

بخوازێ جێبەجێی کاو لە هیچ کەس سڵ نەکاتەوە، دەبێ لێی بترسی. بەم بۆنەوە بە داوودی گوت: «وا لێم بترسە کە لە شێرێکی دڕندە دەترسی». چونکە شێر کە بکوژێ و بدڕێ لە کەس سڵ ناکاو چاوی لە بێگوناحی و گوناحکاری تۆوە نییە، دەبێ بزانی سوڵتانی شێر چ شتێکی دەوێ؛ کە وازی لێت هێنا، لەبەر دڵ پێسووتان یاخۆ ترسان لە تۆ نییە، بەڵکوو لەبەر سووکی و بێ فەڕیتە لە لای وی. ئەوەی ئەم دانستانەی پەروەردگاری زانی، لێی دەترسێ. خواخۆی باشتر لە هەمووان دەزانێ.

## شرۆڤەی ئاقیبەت شەڕی

بزانە، زۆربەی لە خواترسان، لە ئەنجامی ژینیان ترساون، چونکە زانیویانە کە دڵی مرۆڤ ئاڵ و وێری بە سەردا دێ و کاتی مردن، ساتەوەختێکی ئێجگار مەزنە و نازانرێ کە دڵ لەو دەمەدا لەسەر چ دۆخێکە. تەنانەت یەک لە زانایانی ئایینی دەڵێ: «کە کەسێک بناسم و بزانم کە پەنجا ساڵ تاکپەرست بووە، گەر لێم جودا بێتەوەو بڕواتە پشت دیوارێکەوە، ناتوانم شایەتی بدەم کە هێمان تاکپەرستە، چونکە دڵ بەردەوام لە گۆڕاندایە و نازانم بۆ سەر چ شتێ گۆڕاوە». یەکێکیتر دەڵێ: «گەر لێم بپرسن پێت خۆشە لەبەر دەرکی ماڵت شەهید بی، یان لەبەر دەرکی دووکانت بە موسوڵمانی بمری؟ دەڵێم کە مردن لەسەر موسوڵمانی و لەبەر دەرکی دووکانم پێخۆشترە، چونکە نازانم تا بگەمە دەرکی ماڵ لەسەر ئیسلام دەمێنم یان نە». ئەبوودەردا سوێندی خوارد و گوتی: «کەس هێمن نییە لەوەی کە لە کاتی مردندا باوەڕی لێ دەسێننەوە یان نە». سەهلی توستەری دەڵێ: «راسبێژان بەردەوام لە ئاقیبەتشەڕی دەترسن». سەفیانی سەوری لە سەرەمەرگدا بە کوڵ دەگریاو ئەسرینی دادەڕشت، گوتیان: «مەگری، بەزەیی خودا لە گوناحی تۆ گەورەترە». گوتی: «هەرچەند بە باڕستی کێوەکان گوناحبارم، بەلام گەر دڵنیا بایەم کە تاکپەرستانە دەمرم، چ خەمم نەبوو». یەکێک لە گەورەکان قەوینتی دەکرد و شتێکی کە بوو دەیدا بە کەسێک و دەیگوت: «نیشانەی ئەوەی کە لەسەر تاکپەرستی بمرم فلان شتە، گەر ئەو نیشانەت بینی، بەم پارەیە شەکر و ناوەی بادام بکڕە و لە نێوان منداڵانی شاردا دابەشی کەو بڵێ، فلانکەس بە سەلامەت رزگاری بوو، گەریش ئەم نیشانەت نەبینی بە خەڵکی شار بڵێ کە نوێژم بۆ نەکەن و خۆ نەخاپێنن، تا پاش مردن تووشی چاوە نەبم». سەهلی توستەری دەڵێ: «مورید لەوە دەترسێ کە تووشی گوناح بێ، خواناس لەوە دەترسێ کە تووشی کوفر بێ». ئەبوویەزید دەڵێ: «کە دەڕۆم بۆ مزگەوت، دەبینم کە زوونارم لە کەمەردایە و بەرەو کلیسەم دەبا، تا دەگەمە مزگەفت هەروام؛ هەموو رۆژی پێنج جار دەڕۆمە مزگەوت و هەر جار وام لێ دێ». عیسا بە حەوارییەکانی گوت: «ئەنگۆ لە گوناح بترسن، ئێمەش کە پێغەمبەرین لە کوفر دەترسین». یەکێک لە پێغەمبەران ساڵەهای ساڵ تووشیاری برسێتی و

تینوێتی و بارگرانی بوو، لە لای خودا سکالای کرد و گلەو گازەی کرد. وەحی بۆ هات کە: «دڵتم لە کوفر پاراستووە، بەمە رەزا نیت کە داوای دونیا دەکەی؟» گوتی: «خوایا! تەوبەم کرد و پاشگەز بوومەوە، رەزام» و خاکی بە سەردا دەکرد لە ترسی ئەو پرسیارەی.

یەک لە دیاردەکانی ئاقیبەت شەڕی، دوڕازییە. لەم سۆنگەوە یارانی پێغەمبەر لەبەر دوڕازی لە خۆ دەترسان. حەسەنی بەسری گوتی: «گەر ئارخەیان بایەم کە تووشیاری دوڕازی نابم، لە هیچ شتی سەرزەوی ترسم نەبوو». دیسان گوتی: «ناکۆکی نێوان دەروون و رواڵەت و دڵ و زمان لە ریزی دوڕازییە».

**سەرنج:**

بزانە، واتای ئاقیبەت شەڕی کە هەمووان لێی دەترسن، ئەوەیە کە لەسەرەمەرگدا بڕوا لە کەسێک بستێننەوە. هۆکانی ئەمەش زۆر و بەرپیوارن، بەڵام ئەوەی لەم کتێبەدا شیاوی گوتن بێ، دوو هۆوە:

**یەکەم** ئەوەیە کە کەسێک باوەڕی بە داهێنراوێکی پووچەڵ بووبێ و لەسەر ئەوە تەمەنی دانابێ و نەزانێ کە لەسەر هێڵی لارە، کەچی لە کاتی مردندا کارەکانی بۆ خویان بکرێ و رەنگە هەڵەیەکی بۆ ئاشکرا بکرێ و لەم سۆنگەوە لە بڕواکانی‌تریشی دڕدۆنگ بێ و باوەڕی بە باوەڕەکانی خۆی نەمێنێ و بەم دڕدۆنگییەوە بەرەو دوارۆژ بارگەی لێک بنێ. ئەم مەترسییە بۆ داهێنەری دینی و ئەوانەی کەلامەوانن لە بۆسەدایە، هەر چەند پارێزکار و لەخواترس بن؛ بەڵام ساویلکە و نەزانان کە موسوڵمانی رواڵەتین، بەو جۆرەی لە قورئاندا بێژراوە، لەم مەترسییە دەربازن. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «عَصیکُم بِدینِ العَجائزِ وَ اَکثرُ اَهل الجَنَّة البُلهُ». لەم سۆنگەوە پێشوونان خەڵکیان لە کەلام و باس و گەڕان بە دووی بناوانی کارەکان بەربەست دەکرد، چونکە دەیانزانی هەرکەس توانی ئەوەی نییە و تووشیاری داهێنان دێ.

**هۆی دووەم** ئەوەیە کە بڕوا لە بناوانەوە لاواز بێ و دۆستی دونیا پتر لە دۆستایەتی دەگەڵ خودا بەسەر دڵدا داسەپابێ. لە گیانەلادا کە دەبینێ سەرلەبەری شاوەتەکانی لێ دەستێنن و بە تووڕەییەوە لە دونیای وەدەر دەنێن و دەیبەنە شوێنێ کە پێی خۆش نییە، رەنگە لەم سۆنگەوە ئەو کەسەی کە وای بە سەردێنێ لە لای سهێت بێ و ئەو نەختە دۆستایەتی پەروەردگارەشی لەدڵ نەمێنێ. وەکوو کەسێک کە منداڵی خۆی خۆش دەوێ، بەڵام زۆر کەم. کە ئەو منداڵە گراوەکەی ئەم لێی دەستێنێ، ئەو نەختە خۆشویستنەشی لە دڵ دەڕەوێ و دەبێتە دوژمنایەتی. لەم سۆنگەوە پلەی شەهیدبوون گەلێک بەرزە، چونکە لە کاتی مردندا دۆستایەتی دونیای لە دڵ نەماوەو خۆشەویستی خودای بەسەر دڵدا داسەپاوە و خۆی لە کۆشی مردن ناوە؛ گەر هەر لەم دۆخەدا مردن

کەسێک لە ئامێز بگرێ، دەسکەوتێکی زۆر مەزنی دەسکەوتووە، چونکە ئەم دۆخەش خێرا دەگۆڕێ و دڵ لەسەر ئەو دانستەیە نامێنێ. کەواتە، هەرکەس دۆستایەتی پەوەردگاری لە دڵدا زاڵتر بوو، بێگومان لەوەی کە خۆی بە دونیا بسپێرێ، دەرباز بووە و لەم مەترسییەش بە دوورە؛ بۆیە کە کاتی کۆچی بەرەو جیهانی هەرمانەوە دەگا، دەزانێ کە کاتی دیتنی ئازیزەو مردن بە کرێت نازانێ و دڵی تەژی لە خۆشەویستی پەروەردگار دەبێ و دونیای لە لا بێ فەڕو بێ نرخ دەبێ. ئەمە نیشانەی ئاقیبەتبەخێرییە. کەواتە هەرکەس دەیەوێ لەم مەترسییە دوورتر بێ، دەبێ لە داهێنان خۆی بپارێزێ و بەوەی لە قورئان و ئەخباردا هاتووە، باوەڕی بێ و هەرچی دەیزانێ، بیسەلمێنێ و ئەوەش کە نایزانێ، وازی لێ بێنێ و بە کورتی، بڕوا بێنێ؛ هەروەها هان بدا کە خۆشەویستی خودای بەسەر دڵدا زاڵ بێ و دۆستایەتی دونیای لەدڵ نەمێنێ. خۆشەویستی دونیا وا لە دڵی دەڕەوێ کە لەسەر کەوشەنی شەرع ڕێگا ببڕێ تا دونیای لە بەرچاو دزێو بێ و بێزی لێ بێ؛ خۆشەویستی پەروەردگاریش بەوە لە دڵیدا پتر دەبێ، کە بەردەوام یادی بکا و دۆستایەتی دۆستانی کا. بەڵام گەر دۆستایەتی دونیای بەسەر دڵدا زاڵتر بێ، مەترسی زۆرە، هەروەک لە قورئاندا دەڵێ کە گەر باب و منداڵ و ژن و ماڵوسامانتان لە پەروەردگارتان خۆشتر دەوێ، دەسا بە هەڵەدا ڕۆیشتوون، تا فەرمانی پەروەرندەتان دەگا: فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ[1].

## شرۆڤەی چۆنییەتی گەیشتن بە ترس لە خودا

بزانە، یەکەم پلە لە پلەکانی دین، دڵنیایی و ناسینە؛ لە ناسین ترس دێتە دی و لە ترس، پارێزکاری و پشوودرێژی و تەوبە دێتەدی و لە پارێزکاری و تەوبە، ڕاستی و دلبێشی و چاودێری بەسەر بیر و ویر و یادی بەردەوام بەدی دێ و لەوەش خۆشویستن و هۆگری دەخێزێ و ئەمەش ئەوپەڕی مەقەماتە و گەردەنکەچی و سەرسپاردن و تامازرۆیی لق و پۆی خۆشەویستین. کەوابوو، کیمیای بەختەوەری، پاش دڵنیایی و ناسین، ترس لە پەروەردگارەو هەرچی پاش ئەو دێ، بەبێ وی پێک نایەن. گەیشتن بە ترس لە پەروەردگار سێ ڕێ هەیە کە بریتین لە:

**یەکەم** بە زانین و ناسین؛ کە کەسێک پەروەرندەی بە جوانی ناسی، بە ناچاریش لێی دەترسێ. ئەوەی لە ژێر پەنجەی شێردا گێر کەوتبێ و چابزانێ کە شێر چییە، نیازی بە شرۆڤە و لێکدانەوە نییە کە بترسێ، بەڵکوو بۆ خۆی دەبێتە ترس. ئەوەی گەورەیی و دەسەڵات و بێنیازی خوای لە خەڵک ناسی و بێدەرەتانی و داماوی خۆی زانی، چاک تێدەگا لە پەنجەی شێردا گیر کەوتووە. ئەوەی تێگەیشت کە پەروەردگار بە دەسەڵاتی خۆی، ئەوەی بیهەوێ جێبەجێی دەکا، تەنانەت یەکێک بێ

---

١ ـ (قورئان، ٢٤/٩) چاوەنۆڕبن تا فەرمان لە خوداوە دێ. (هـ)

چاکە بەختەوەر دەکاو یەکێکیتر بەبێ خراپە بەختڕەش دەکاو ئەوەی پێی خۆش بێ، بێگومان دەیکاو لە گفتی خۆی پاشگەز نابێتەوە، بێشک لێی دەترسێ. بەم بۆنەوە پێغەمبەر فەرمووی کە: «مووسا و ئادەم پێکرا دەئاخافتن و بەڵگەیان بۆیەک دێنایەوە. مووسا گوتی: "پەروەرندەم تۆی لە بەهەشت دانا و گەلێک چاکەی دەگەڵ کردی، بۆچی تۆ لە فەرمانی لات دا و هەم خۆت و هەمیش ئێمەت تووشی مێمڵ کرد؟" گوتی: "باوەڕت هەیە کە ئەو گوناحە لە ڕۆژی ئەزەلەوە لە چارەم نووسرابوو؟" گوتی: "نووسرابوو". ئادەم گوتی: «هیچ دەمتوانی بە ئاوەژووی ویستی ئەو ببزوومەوە؟" گوتی: "نە". مووسا لە بەرانبەر بەڵگەکانی ئادەم هیچی پێ نەبێژراو بەڵگەیەکی بۆ نەهێنرایەوە».

ئەو دەرگایانەی زانست کە ترسیان لێ دەخێزێ، زۆروزەوەندەن و هەرکەس زاناتر بوو، زۆرتر لە خودا دەترسێ.

تەنانەت دەگێڕنەوە کە «جوبرەئیل و پێغەمبەر پێکڕا دەگریان؛ وەحی هاتە سەریان کە بۆچی دەگرین. ئێوەم بێوەی کردووە؟» گوتییان: «خودایا! لە فێڵی تۆ بێوەی نین». گوتی: «کەواتە لەسەر گریانتان بەردەوام بن». ئەمە لە سۆنگەی فرەزانیانەوە بوو کە دەیانگوت نەکوا ئەوەی پێمان بێژراوە تاقی کردنەوەیەک بێ و لە ژێر ئەوەدا نهێنیەک شراوە بێ کە تێگەیشتنی بۆ ئێمە ئەستەمە.

ڕۆژی شەڕی بەدر سەرەتا لەشکری موسوڵمانان خەریک بوو بشکێ، پێغەمبەر ترسا و گوتی: «پەروەرندەم! گەر ئەم موسوڵمانانە تێکبشکێن و بکوژرێن، لەسەر زەویدا کەس نییە کە بتپەرستێ». سددیق گوتی: «بۆچی خودا سوێند دەدەی؟ بەڵێنی سەرکەفتنی پێت داوە و بێشک لە گفتی خۆی کلا نابێ». ئەبووبەکر لەم کاتەدا لە پلەی متمانە بە گفت و بەزەییدا بوو، کەچی پلەی پێغەمبەر ترس لە فێڵی پەروەردگار بوو، ئەمەش تەواوترە؛ چونکە دەیزانی کەس سەر لە بناوانی کاری خودا دەرناکا.

**ڕێگای دووەم** ئەوەیە گەر بۆ خۆی لە گەیشتن بە ناسین ناتوانە، دەبێ ببێتە هاوڕێ و هاودەمی لە خواترسان، تا ترسی ئەوانی بە سەردا کاریگەر بێ و لە نەزانان خۆی بپارێزێ؛ لەمەش ترس دێتە دی، هەرچەند تەنیا بە سەیرکردن بێ. وەکوو منداڵ کە دەبینێ بابی لەبەر مار هەڵدێ، ئەمیش بەبێ ئەوەی زیانی مار بزانێ و بناسێ، لەبەری هەڵدێ و لێی دەترسێ. ئەم ترسە، لە ترسی زانا، لاوازترە؛ چونکە گەر منداڵ چەن جار ببینێ کە مارگرێک دەست بۆ مار رادەکێشێ و مار دەگرێ، ئەمیش وەک چۆن بە چاولێگەری لێی ترساوە، بە چاولێگەریش لێی ناترسێ و دەستی بۆ رادەکێشێ، کەچی ئەوەی کە مار چاک دەناسێ، لە ژاری مار دەترسێ و خۆی لێ دەبوێرێ. کەواتە، دەبێ چاولێگەر و پێڕەو لە هاوقسەیی نائاگایان خۆی ببوێرێ و لێیان دوورەپەرێز بێ، بەتایبەت ئەوانەی کە خۆیان بە زانا پیشان دەدەن.

**ڕێگای سێهەم** ئەوەیە کە گەر ئەم کەسانەی نەبینی لە گەڵیان هەڵسوکەوت کا -چونکە لەم ڕۆژگارەدا بەدەگمەن کەسی وا دەست دەکەوێ- چاتر وایە کە خەریکی خوێندنەوەی کتێبی سەربهورد و بارودۆخی ئەم کەسانە بێ. بەم بۆنەوە ئێمەش سەربهوردی هەندێ لە پێغەمبەران و دۆستانی خودا لە مەڕ ترس دەگێڕینەوە تا ئەوانەی کە نەختێ ئاوەزیان هەیە، بزانن ئەم کەسانە کە ژیرترین و زاناترین و پارێزکارترینی خەڵک‌وخوا بوون، چۆن دەترسان، جا خەڵکی‌تر دەبێ چەندە لەبەر خودا بترسن.

## چیرۆکی پێغەمبەران و فریشتەکان

دەگێڕنەوە کە: «کاتێ ئیبلیس کەوتە بەر لەحنەتی خودا، جوبرەییل و میکاییل بەردەوام دەگریان. پەروەردگار وەحی ناردنە سەر و پێی گوتن: "بۆچی دەگرین؟" -هەرچەن خۆی زاناترە- گوتیان: "لە فێڵی تۆ هێمن نین". گوتی: "دەبێ هەروا بێ، کەواتە بگرین"».

محەممەدی کوڕی مونکەدێر دەڵێ کە: «کاتێ پەروەردگار دۆژەهی ئافراند، فریشتەکان گریان، کە مرۆڤی ئافراند هێۆر بوونەوە چونکە دڵنیابوون بۆ ئەوی ئافراندووە».

پێغەمبەر فەرمووی: «قەد نەبوو جوبرەییل بێتە لام و لە ترسی پەروەردگار گیانی نەلەرزێ».

ئەنەس دەڵێ: «پێغەمبەر لە جوبرەییلی پرسیار کرد کە: "بۆچی قەد میکاییلم بە بزەوە نەدیوە؟" گوتی: "لەو دەمەیڕا ئاوریان ئافراندووە پێنەکەنیوە"».

کاتێ ئیبراهیمی‌خەلیل بۆ نوێژ خوێندن ڕادەوەستا، کوڵی دڵی لە یەک میل ئەولاترەوە دەگەیشتە گوێ. موجاهید دەڵێ: «داوودی پێغەمبەر چل ڕۆژی تەواو بە کوڵ گریاو سەری لەسەر خاک هەڵنەگرت، تا شوێنی ئەسرینەکەی ڕوەک ڕوا». وەحی هاتە سەری کە: «ئەی داوود! بۆچی دەگری؟ گەر برسیتە یان تینووتە تا نان و ئاوت بۆ بنێرم؟ گەریش رووتی تا جلکێکت دەبەرکەم». هەناسەیەکی هەڵکێشا کە لە بەر تینی دار دەسووتا. بۆیە پەروەردگار تۆبەی لێ وەرگرت.

گوتی: «پەروەرێنەرم! گوناحەکانم لەناو لەپم بکێشە تا لە بیریان نەکەم». پەرسڤی دوعای دایەوە. دەستی بۆ هەر خواردن و خواردنەوەیەک کە دەبرد، ئەو گوناحەی دەدی و دەگریا؛ جاری وا بوو پەرداخێکی نیوەیان پێ دەدا، بە ئەسرینی ئەو پڕ دەبوو.

دەگێڕنەوە کە: «داوود ئەوەندە گریا کە خوستی لێ بڕا، گوتی: "پەروەرندەم! بەزەییت دێ بەم گریانەی من؟" وەحی هاتە سەری کە: "باس لە گریانت دەکەی؟ مەگین گوناحەکانت لە بیر کردووە؟" گوتی: "خودایا! چۆنی لە بیر دەکەم لە کاتێکدا ڕابردوو کە هەڵە و پەڵەم نەکردبوو، کاتێ زەبوورم دەخوێندەوە ئاوی نێو ڕووبار و بای گەڕۆک لە ڕۆیین ڕادەوەستان و مەل و مۆری دەشت و

گیاندارانی سارام لێ کۆوە دەبوون، کەچی ئێستا هیچ لەوانە نەماوە، خوایا ئەمە چ کارەساتێکە؟" گوتی: "ئەی داوود! ئەوە تاسەی عیبادەت بوو، کەچی ئەمە ترس لە گوناحە. ئەی داوود! ئادەم بەندەی من بوو، بە بۆنەی بەزەیی خۆمەوە ئافراندم، لە گیانی خۆمم فوو پێدا کرد و بە فریشتەکانم گوت کڕنۆشی بۆ بەرن، خەڵاتی گەورەییم دەبەرکرد، تاجی سەربەزیم لەسەر کرد؛ کاتێ لە تەنیایی خۆی گازندەی کرد، حەووام لە تەنشتی خۆی ئافراند و هەردووکیانم لە بەهەشتدا دانا؛ بە هەڵەیەک رووت و پەتی لە بەهەشتیانم وەدەرنا. ئەی داوود! بژنەفەو بە راست بژنەفە: رێزت گرتین، رێزم گرتی، ئەوەی ویستت پێم دای؛ هەڵەت کرد، دەرفەتم پێ دای، ئێستا بەم هەموو گوناحیشەوە، گەر لە گوناحت پاشگەز ببیتەوە، ئامێزت بۆ دەکەمەوە"».

یەحیای کوڕی کەسیر دەگێڕێتەوە کە: «کاتێ داوود ویستی بەسەر گوناحەکانیدا بگریێ و بیانلاوێنێتەوە، حەوت رۆژ هیچی نەخوارد و ئاوڕی لە هیچ ژنێ نەدایەوە. پاشان رۆیشتە نێو بیاوان و بە سلەیمانی گوت کە بە خەڵک بڵێ هەرکەس دەیەوێ لاوانەوەی داوود ببیسێ، بێت بۆ سارا. بۆیە خەڵکی لە نێو شار و گوند، مەل و مۆر لە چۆڵ و دەشت و هەموو گیانداران لە هەموو شوێنەوە روویان لە سارا نا. داوود سەرەتا بە پەسنی پەروەردگارەوە دەستی پێکرد و خەڵک هاواریان دەکرد، دواتر پەسنی بەهەشت و دۆزەهی کرد، پاشان گوناحەکانی خۆی لاواندەوە و خەڵکێکی زۆر لە ترسان مردن؛ سلەیمان پێی گوت: "بابە بەسیەتی، خەڵکێکی زۆر مردن". بانگیان کرد کە فلان و فلان بە رەحمەتی خودێ چوون، تا خزمانیان هاتن و هەرکەس مردووی خۆی بردەوە. لەو رۆژەدا لە چل هەزار کەس کە لەوێ بوون، سی هەزار کەس ئەمری خودایان بەجێهێنا؛ داوود دوو کارەکەری بوو کە لە ئاوەها کاتێکدا کاریان ئەوە بوو کە رایاندەگرت تا ئەندامانی لێک هەڵنەوەشن».

یەحیای کوڕی زەکەریا لە بە یتولموقەدەسدا عیبادەتی دەکرد؛ منداڵ بوو، کاتێ منداڵانیتر بۆ یاریکردن گاسیان دەکرد، دەیگوت منیان بۆ یاری نەخولقاندووە؛ کە بوو بە پانزدە ساڵان، رووی لە چۆڵ ناو لە شار و لە خەڵک دوور کەوتەوە. رۆژێک زەکەریا کەوتە دووی، دی کە لە لای رووبارێک راوەستاوەو لە تینوێتیدا کەوتۆتە گیانەلا و دەڵێ: «سوێند بە گەورەییت کە ئاو ناخۆمەوە تا نەزانم لە لای تۆ چ جێگایەکم هەیە». ئەوەندە گریابوو کە گۆشتی لە روو نەمابوو و دانی لە ژێر پێستەکەیەوە خویان بوو، لەتە بەرێکی بەسەر خۆیدا دەدا تا کەس نەیبینێ.

وەکوو ئەم چیرۆکانە لەسەر پێغەمبەران گەلێک زۆرن.

### سەربهووردی ئەسحاب و پێشوونان

بزانە، سدیق بەو هەموو گەورەییەی کە بووی، کاتێ مەلێکی دەدی دەیگوت: «بریا من ئەو مەلە

بایەم».

ئەبووزەری غەففاری دەیگوت: «بریا من دار بوایەم».

عایشە دەیگوت: «خوزیا کە هیچ ناو و نیشانێک لە من نەبوایە».

عومەر جاری وا بوو کە ئایەتێکی قورئانی دەبیست، دەکەوت و دەبوورایەوەو چەن رۆژان خەڵکی بۆ سەردانی دەهاتن، دوو هێڵی رەش کە شوێنەواری ئەسرین بوو، بەسەر گۆنایدا دیار بوو و دەیگوت: «بریا عومەر قەد لە دایک نەبوایە».

جارێک لەبەر دەرکی ماڵێکەوە رادەبورد، یەکێک قورئانی دەخوێند، گەیشتبووە ئێرە کە «إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ، مَّا لَهُ مِن دَافِعٍ [1]»، لە ئەسپەکەی هاتە خوار و لەبەر بێقەراری خۆی بە دیواری خانوویەکدا دا؛ بردیانەوە بۆ ماڵ، یەک مانگی تەواو نەخۆش بوو و لە ماڵدا کەوت، کەس هۆی نەخۆشییەکەی نەزانی.

عەلی کوڕی حوسەین کاتی دەسنوێژ شۆردن، رووی زەرد هەڵگەڕا. گوتیان: «چ بووە؟» گوتی: «نازانن لەبەرانبەر کێ رادەوەستم؟»

«مسور بن مخزمة» توانی گوێ شل‌کردن بۆ قورئانی نەبوو. رۆژێ کابرایەکی بیانی کە عادەتی ئەمی نەدەزانی، ئەم ئایەتەی خوێندەوە" «يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ، وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا [2]». گوتی: «ئێمە لە تاوانبارانین نەک لە پارێزکاران»، وتی جارێک‌تر بۆمی بخوێنەوە. خوێندیەوە، هاوارێکی کرد و ئەمری خودای بەجێ‌هێنا.

حاتەمی ئەسەم دەڵێ: «بە شوێنی خۆش خەڕە مەبە، چونکە هیچ کوێ خۆشتر لە بەهەشت نییە، دەزانی ئادەم لە بەهەشتدا چی بەسەر هات؟ بە زۆروزەوەندەبوونی عیبادەتیش خۆ مەخڵەتێنە، دەزانی ئیبلیس چی بەسەر هات؟ زانستی زۆریش نەتخاپێنێ، بەلعەمباعوور لە زانستدا گەیشتە ئاستێ کە بەرزترین ناوی خودای دەزانی، کەچی خودا پێی گوت: فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ [3] ٱلْكَلْبِ دیداری پیاوچاکان نەتفریوێنێ، چونکە زۆربەی خزمانی پێغەمبەر زۆر پێغەمبەریان دی و نەبوونە موسوڵمان».

سری سەقەتی دەڵێ: هەر رۆژ سەیری رووەمتم دەکەم، دەڵێم بزانم رووم رەش بووە.

عەتای سولەمی لە ریزی خواترسەکان بوو. چل‌ساڵ پێنەکەنی و سەیری ئاسمانی نەکرد، جارێک سەیری ئاسمانی کرد، لە ترسانا هەڵدێریا؛ هەرشەو چەن جار دەستی بە روویدا دێنا تا بزانێ دزێو

---

١ ـ (قورئان، ٧/٥٢ و ٨) ئازاری پەروەرندەی تۆ هەر روو دەدا؛ کەسیش پێشی پێ ناگیرێ. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ٨٥/١٩ و ٨٦). لەو رۆژەدا کە ئێمە خۆپارێزەکان بە پانەوە دەبەینە دیداری خودا، تاوانبارانیش بۆ دۆزەخ [وەکوو گاگەل بۆ سەراو] دەمتینگ رەپێچەک دەدەین. (هـ)

٣ ـ (قورئان، ١٧٦/٧). نەزیلەی ئەمە وەکوو نەزیلەی سەگە. (هـ)

بووە یان نە؛ گەر مێملێ یان کارەساتێ یان سیاسالی تووشی خەڵک بوایە، دەیگوت: «ئەمە هەمووی لە بەدفەڕی منە، گەر من بمردایەم خەڵک رزگار دەبوون».

ئەحمەدی حەنبەل دەڵێ: «لە خوا پاڕامەوە کە دەرگایەک لە ترسم بۆ بکاتەوە. دوعاکەم وەرام درایەوە؛ ترسام ئاوەزم تێک بچێ، گوتم: "خوایا! بە قەدەر وزەم"، پاشان دڵم ئوقرەی گرت».

پارێزکارێکیان بینی کە دەگریا، گوتیان: «بۆچی دەگری؟» گوتی: «لە ترسی ئەو دەمەی کە بانگ کەن و بڵێن خەڵکی لە پەسلاندا کردەکانیان دەپێون».

یەکێک لە حەسەنی بەسری پرسی: «چۆنی؟» گوتی: «چۆنە حالی کەسێک کە لەگەڵ تاقمێکی-تر لە نێو گەمیەو لەسەر زەریا بن، گەمیە تێک بشکێ و هەرکەس لەسەر لەتە چێوێ خۆی راگرتبێ؟» گوتی: «دژوارە». گوتی: «حالی من وایە». دیسان گوتی: «لە خەبەردا هاتووە کە «یەکێک دوای هەزار ساڵ لە دۆزەخ دەردێنن» بریا ئەو کەسە من بوایەم». ئەمەی بۆیە گوت کە لە ترسی ئەنجام خراپی، لە دۆژەهی هەتاهەتایی دەترسا.

عومەری عەبدولعەزیز کارەکەرێکی بوو، رۆژێ لە خەو ڕابوو، گوتی: «گەورەم! خەونێکی زۆر سەیرم بینی». گوتی: «بیلێ». گوتی: «دۆژەهم بینی کە پێکرابوو، پردی سیراتیان بە سەریدا هەڵدابوو. خەلیفەکانیان هێنا، سەرەتا عەبدولمەلیکی مەروانم دی کە هێنایان و گوتیان بەسەر ئەم پردەدا برۆ. هەنگاوی نەگۆڕابۆوە کە کەوتە خواری؛ پاشان کوڕی وی وەلیدیان هێنا، ئەویش کەوتە خوار؛ ئینجا سلەیمانی کوڕی وەلیدیان هاورد، ئەویش داکەوت». گوتی: «دیسان بلێ». گوتی: «گەورەم! پاشان تۆیان هێنا»، کە ئەمەی گوت عومەر نەعرەتەی کێشاو کەوت و بوورایەوە. کارەکەرەکە هاواری کرد و گوتی: «بەخودا گەورەم تۆم بینی کە بە بێوەی تێپەڕای». کچەکە هاواری دەکرد و ئەویش هەروا دەست و پای دەوەشاند.

حەسەنی بەسری سالەهای ساڵ پێنەکەنی، وەکوو ئەوەی بوو کە دیلەو هێناویانە سەری ببڕن، پێیان گوت: «بۆچی بەم هەمووو پەرستن و بەندەگییەوە وا سووتاوی؟» گوتی: «زۆر دەترسم کە پەروەردگار هەڵەیەکی لێم دیبێ و بەو هەڵەیە منی بە دوژمنی خۆی زانیبێ، بلی: "هەرچی دەتەوێ بیکە، هیچ بەزەییم پێتدا نایێ" و منیش بەبێکەڵک خۆم برەتێنم».

ئەم سەربهوردانە و وەکوو ئەمانە گەلێک زۆرن. جا بزانە ئەمانە چەن دەترسان و تۆ لە خۆت دڵنیای؛ یا ئەوەیە کە ئەوان گوناحی زۆریان هەیە و تۆ بێگوناحی؛ یان ئەوەیە کە ئەوان زۆر دەزانن و تۆ نەزانی؛ هەروەها تۆ چونکە نەزان و بێ ئاگای و هەڵەو پەڵەی زۆریشت هەیە، لە خۆت دڵنیای، کەچی ئەوان چونکە زۆرزان و دڵڕوونن و چاوی دڵیان سەیری جیهانی سەروو دەکا، بەو حەمکە

عیبادەتەوە، هێشتا دەترسن.

**سەرنج**

ڕەنگە کەسێک بڵێ، خەبەری هێژابوونی ترس و هیوا گەلێک زۆرە، لەم دوانە کامیان هێژاترەو کامیان سەرترە. بزانە، ترس و هیوا وەکوو دوو دەرمانن، بە دەرمان ناڵێن هێژا، دەڵێن بە کەڵک. ترس و هیوا، هەروەک بێژرا، لە دانستەکانی ناتەواو بوونن. تەواوتری مرۆڤ بەوەیە کە نوقمی خۆشەویستی پەروەرندەی بێ، بەوەی کە دڵ و گیانی تژی لە یادی خودا بێ و بیر لە ڕابردوو و داهاتوو نەکاتەوە؛ دەبێ سەیری دەم و کات کا، تەنانەت سەیری دەم و کاتیش نەکا، بەڵکوو سەیری خودانی دەم کا. کە سەیری ترس و هیوای کرد، ئەمە دەبێتە پەردەیەک لە بەردەمی، بەڵام ئەم دۆخە زۆر دەگمەنە. کەواتە، ئەوەی لە مردن نزیک دەبێتەوە، دەبێ هیوای زۆرتر بێ، چونکە هیوا، خۆشەویستی پتر دەکا؛ ئەوەی لەم جیهانە دەڕوا، دەبێ خۆشەویستی خودای لە دڵدا بێ، تا بە دیداری خودا بەختەوەر بێ، چونکە دیتنی خۆشەویست و گراو گەلێک خۆشە.

بەڵام لە کاتانیتردا: گەر مرۆ لە نائاگایانە، دەبێ ترسی بە سەردا زاڵ بێ، چونکە بۆ ئەم کەسانە، هیوا ژارێکی کوشندەیە؛ گەر پارێزکارەو دڵی خۆی لە پیسایی دونیا پالاوتووە، دەبێ ترس و هیوای وەکوو یەک بن؛ گەر لە کاتی عیبادەتدا بوو، دەبێ هیوای بەسەر دڵدا زاڵ بێ، چونکە دلبێشی لە کاتی عیبادەتدا لە خۆشەویستیوە دێتە دی و هیواش دەبێتە هۆی خۆشەویستی؛ بەڵام لە کاتی گوناحدا دەبێ ترس لە دڵیدا سەرتر بێ؛ تەنانەت لە کاتی کارگەلی ڕەواشدا دەبێ هەر ترس سەرتر بێ -گەر ئەو کەسە پارێزکار و پەرستندەی پەروەردگار بێ- ئەگینا تووشی هەڵە و پەڵە دێ. کەواتە قازانجی ئەم دەرمانانە بە پێی باردۆخی مرۆڤ لە گۆڕان دایە. ئەم وەڵامە موتڵەق نییە.

## بنەمای چوارم - هەژاری و پارێزکاری

بزانە، بناغەی دین لەسەر چوار بنەما دانراوە، ئەم چوار بنەما -کە لە بەشی موسوڵمانیدا راڤەمان کرد- بریتین لە: نەفسی خۆت، پەروەردگار، دونیا و دوارۆژ. لەم چوارە دوویان پشکنینە و دوویان بازدانە؛ بازدان لە خۆوە بۆ دیتنەوەی پەروەردگار؛ بازدان لە دونیا بۆ دیتنی دوارۆژ. کەواتە تۆ دەبێ، لە خۆتەوە بەرەو خودا رووی بگێڕیەوەو لە دونیاوە بەرەو دوارۆژ. پشوودرێژی و ترس لە خودا و پاشگەزبوونەوە لە گوناح، هەموویان دەسپێکی ئەم رێگان. دۆستی دونیا جەردەی رێگایە، هەر بەو چەشنەی کە دەرمانەکەیمان راڤە کرد؛ دوژمنی دەگەڵ دونیاو دابڕان لێی رزگارکەرەوەی ئەم رێگایەو ئێستا دینە سەر راڤەی ئەم بەشە و مەبەستمان لە هەژای و پارێزکاری هەر ئەوەیە. کەواتە دەبێ سەرەتا راستەقینەیان بناسی.

### راستەقینەی هەژاری و پارێزکاری

بزانە، هەژار ئەوەیە کە ئەو شتەی نیازی پێیە، نییەتی و لە دەستیدا نییە. مرۆڤ سەرەتا پێویستی بە خۆیە، پاشان بە ژیانی خۆی نیازی هەیە، ئەوسا بە خواردن و ماڵوسامان و شتیتر. لەم شتانەش هیچیان لە دەستی ویدا نین و کەچی پێویستی پێیانە. دەوڵەمەن ئەوەیە کە لە هەموو کەس بێنیاز بێ، ئەمەش تەنیا یەک کەسە. خوای مەزن و دلۆڤان.

بێجگە لە خوا هەرچی هەیە، هەرچی دەبێ و هەرچی بووە لە جن و مرۆڤ و فریشتە و شەیتان، بوونیان و ژینیان بە دەستی خۆیان نییە. کەواتە، بە راستی کە هەموویان هەژارن. بۆیە پەروەردگار فەرمووی: وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ[1]؛ واتە: بێنیاز هەر خودایە و هەمووی ئێوە هەژارن. عیسا هەژاری وا شرۆڤە کرد و گوتی: «اَصبَحتُ مُرتَهِناً بِعَلَمی وَالاَمرُ بِیَدِ غَیری فَلا فَقیر اَفقَرُ مِنّی»؛ واتە: من لە گرۆی کردەوەی خۆمم و کلیلی ئاکاریشم لە دەست کەسێکیتردایە، دەسا کام هەژار لە من هەژارترە.

---

١ ـ قورئان، ٣٨/٤٧.

بەڵکوو پەروەردگار ئەمەشی وا راڤە کرد و گوتی: وَرَبُّكَ ٱلْغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ[1] واتە: بێنیاز و دەوڵەمەن ئەوەیە کە گەر بیەوێ هەمووان دەفەوتێنێ و هۆزێکی دی دەخولقێنێ.

کەواتە هەموو خەڵکی هەژارن. بەڵام هەژار لە زاراوەی تەسەووفدا بە کەسێک دەڵێن کە خۆی بەم دانستەیە بزانێ و تێگەیشتبێ کە هیچی نییە و هیچ شت لە دەستی ویدا نییە، نە لەم جیهان و نە لەو جیهان، نە لە سەرەتای ئافراندندا و نە لە درێژەیدا.

بەڵام ئەمەی کە هەندێ گێل و نەزان دەڵێن ئەو کاتە هەژاری کە هیچ عیبادەت نەکەی، چونکە کە عیبادەتت کرد و پاداشی ئەوە رەگەڵ خۆت خەی، لە هەژاری دەر دی و شتێکت هەیە؛ ئەم بیرە تووی زندیقی و ئەباحەتییە کە شەیتان دەیچێنێتە دڵ. شەیتان ئەو گێل و نەزانانەی کە خۆ بە ژیر و لێهاتوو دەزانن، بەم چەشنە لە رێ لادەدا و واتای خراپیان بە پەیڤی جوان بۆ دەخەملێنێ تا نەزانان بەم چەشنە فریو بخۆن و خۆ بە لێهاتوو بزانن. ئەمە وەکوو ئەوەیە کەسێک بڵێ هەرکەس خودای بێ، هەموو تشتێکی هەیە، دەبێ لە خودا بێزار بێ تا بێتە هەژار. بەڵام هەژار ئەوەیە کە عیبادەت کا، هەر وەک عیسا گوتی: «پەرستنیش لە من نییە و بە دەستی من نییە و من لە گرۆی ئەوم». بە کورتی، ئەوەی مەبەستی سۆفییانە لە هەژاری، ئەمە نییە، هەروەها هەژاری مرۆڤیش هەر ئەمە نییە؛ لە درێژەدا هەژاری لە ماڵوسامان راڤە دەکەین و پیشانی دەدەین کە لە سەدهەزار نیازی مرۆڤ، تەنیا یەکێکیان ماڵوسامانە.

کەواتە، نەبوونی ماڵ یان لەم سۆنگەوەیە کە پیاو بە ویستی خۆی وازی لێ دێنێ، یا ئەوەیە کە بە دەستی ناهێنێ. گەر بە ویستی خۆی وازی لێ هێنا پێی دەڵێن پارێزکاری؛ بەڵام گەر بە دەستی نەهێنا پێی دەڵێن هەژاری. هەروەها هەژار سێ دۆخی هەیە:

**یەکەم** ئەوەی کە ماڵی نییە، بەڵام تا دەتوانێ بۆ بە دەستهێنانی هان دەدا؛ بەمە دەڵێن هەژاری چاوچنۆک.

**دووەم** ئەوەیە کە بۆ ماڵوسامان پەل ناوەشێنێ و گەریش پێی بدەن بە درێوی دەزانێ و بەمە دەڵێن پارێزکار.

**سێهەم** ئەوەیە کە ناکەوێتە دووی، گەریش پێی بدەن وەریدەگرێ و پێشی نەدەن داوا ناکا؛ بەمە دەڵێن هەژاری چاوتێر.

---

۱ ـ (قورئان، ۱۳۳/٦) پەروەرندەت دلۆڤانە. ئەگەر خۆی نارەزوو بکا، ناتانهێڵێ و حەزێ بکا لە پاش ئێوە چینێکیتر لە شوێنی ئێوە دادەنێ؛ هەروەک ئێوەی لە تۆرەمەی کەسانیتر خستوتەوە. (هـ)

ئێمە سەرەتا هێژایی هەژاری و پاشان پارێزکاری راڤە دەکەین. چونکە نەبوونی ماڵ -هەرچەن پیاو بۆ بە دەستهێنانی چاونەزێر بێ- هێژایە.

## هێژایی هەژاری

بزانە کە خودا دەڵێ: لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ[1] هەژاری لە پێش دوورەوڵاتەوە هێناوە. پێغەمبەریش فەرمووی: «پەروەردگار هەژاری خێزانباری پارێزکاری خۆش دەوێ». دیسان گوتی: «ئەی بیلال! هان بدە تا کاتێ لەم دونیا بەرەو جیهانی هەرەمانەوە رۆیشتی، هەژار بی نەک دارا». دیسان گوتی: هەژارانی ئۆمەتی من پێنجسەد ساڵ بەر لە دەوڵەمەندان دەڕۆنە نێو بەهەشتەوە. بە گوتەیەکی‌تر: «چل‌ساڵ». رەنگە بە یەکێکیان هەژاری چاونەزێری مەبەست بووبێ و لەویتریان هەژاری چاوتێر.

دیسان فەرمووی: «چاترینی ئۆمەتی من، هەژارانن. هەروەها ئەوانەی زووتر دەڕۆنە نێو بەهەشتەوە، کەم دەسانن». هەروەها فەرمووی: «دوو پیشەم هەیە، هەرکەس ئەو دوانەی خۆش بوێ، منی خۆش دەوێ: هەژاری و خەزا». دەگێڕنەوە کە جوبرەییل گوتی: «ئەی محەممەد! پەروەردگار سڵاوت بۆ دەنێرێ و دەڵێ: دەتەوێ هەموو کێوەکانی زەوینت بۆ بکەم بە زێڕ تا هەر شوێنێک کە دەتەوێ دەگەڵت بێن؟» گوتی: «نە، ئەی جبرەییل! چونکە دونیا خانووی بێ خانووان و ماڵی بێ ماڵانەو کۆکردنەوەی ماڵ‌وسامان تێیدا، کاری بێ‌ئاوەزانە». گوتی: «یا مُحَمَّدُ ثَبَّتَکَ اللهُ بِالقَولِ الثَّابِتِ[2]». عیسا بەسەر خەوتووێکدا تێپەڕی، گوتی: «رابەو یادی پەروەرێنەرت کە». گوتی: «چیت لێم دەوێ؟ من دونیا و هۆگرانیم پێکڕا واز لێهێناوە». گوتی: «دەسا بنوو ئەی هاوڕێ، خۆش بنوو». مووسا لە لای کابرایەک رابورد کە نووستبوو، کەرپووچێکی لە ژێر سەرنابوو و بێجگە لە بەڕێک هیچی دی نەبوو؛ گوتی: «خودایا! ئەم بەندەیەت زۆر هەژارە، هیچی نییە». وەحی هات گوتی: «ئەی مووسا! مەگین نازانی هەرکەس من بە تەواوی سەرنجی بدەمێ و بەزەییم پێیدا بێتەوە، بە تەواوی لە دونیای دادەبڕم». ئەبووڕافیع دەڵێ: «پێغەمبەر میوانی هات، پێی گوتم: "برۆرە لای فلان جوولەکەو بڵێ ئاردم بە قەرز بداتێ. سەرەتای مانگی رەجەب پێی دەدەمەوە". رویشتم، کابرای جوولەکە گوتی: "نەوەڵڵا! بێ بارمتە نایدەم". گەڕامەوەو راستی رووداوم بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە. فەرمووی: "سوێند بە خودا کە لە ئاسمان و لە زەویدا دەسپاک و باوەڕ پێکراوم و گەر پێمی بدایە، پێم دەدایەوە، ئێستا ئەم زرێیەی بۆ ببەو بە بارمتە داینێ و ئارد بێنە". بردم. بۆ دڵخۆشی دانەوەی

---

١ ـ (قورئان، ٨/٥٩) ئەو هەژار و دووروڵاتانە کە لە ماڵ و زێدی خۆیان دەرکراون. (هـ)

٢ ـ ئەی محەممەد! پەروەردگار بە پەیڤی پتەو راوەستاوت کا.

پێغەمبەر ئەم ئایەتە هاتە خوار: وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا[1]؛ واتە: بە سیلە چاویش نابێ سەیری دونیا و خەڵکەکەی کەی، چونکە ئەوە بەڵای ئەوانی تێدایە، کەچی ئەوەی بە تۆ دراوە لە لای پەروەرندەت هێژاتر و چاترە». کەعبولئەحبار دەڵێ: «وەحی هاتە سەر مووسا کە ئەی مووسا! گەر هەژاری رووی لێخستی، بڵێ: "مَرحَباً بِشعار الصالحِن[2]"».

پێغەمبەر فەرمووی: «بەهەشتیان پێنواندم، زۆربەی خەڵکەکەی هەژار بوون؛ دۆزەقیان پێپیشاندام، زۆربەی خەڵکەکەی دەوڵەمەندان بوون». فەرمووی: «لە بەهشتدا کەمتر ژنم بینی. گوتم لە کوێن؟ گوتیان: "شَغَلهُنَّ الأحمرَان. اَلذهَبُ وَ الزَّعفَرانُ"؛ واتە: زێڕ و جلکی ئاڵوواڵا دەبەندی کردوون».

دەگێڕنەوە کە: «پێغەمبەرێک لە تەنشت زێیەکەوە رادەبورد. ماسیگرێکی بینی کە داوی دەهاویشت، گوتی: "بە ناوی خودای گەورەو مەزن". هیچ ماسیەکی بۆ نەگیرا. راوچییەکیتر داوی هاویشت و گوتی: "بە ناوی شەیتان"، داوەکەی پڕ لە ماسی هێنایەدەرەوە. پێغەمبەرەکە گوتی: "خوایا! دەزانم هەموو ئەمانە هی تۆن، بەلام لە هۆکەی نەگەیشتم". پەروەردگار بە فریشتەکانی گوت: جێگای ئەو دوو راوچییەی لە بەهەشت و دۆژەهدا پێ پیشان دەن. پیشانیان دا؛ کە چاوی پێکەوت گوتی: "خوایا! رازی بووم"».

پێغەمبەر فەرمووی: «دوایین کەس لە پێغەمبەران کە دەڕواتە نێو بەهەشتەوە، سلەیمانە؛ دوایین کەسیش لە یارانی من کە دەڕواتە نێو بەهەشتەوە، عەبدولڕەحمان کوڕی عوفە؛ بە بۆنەی دەوڵەمەندییانەوە». دیسان فەرمووی: «کە پەروەردگار کەسێکی خۆش بوێ، تووشیاری بەڵا و کارەساتی دەکا، گەریش خۆشەویستیەکەی تەواو بێ، هەژاری دەخا». گوتیان: «گەورەم! هەژاری چۆنە؟» فەرمووی: «نە ماڵی بۆ دیڵێ و نە بنەماڵە». مووسا گوتی: «پەروەردگار! دۆستانی تۆ کێن، تا بیمە دۆستیان؟» فەرمووی: لە هەر کوێدا هەژارێک هەیە. هەژار، واتە هەژاری تەواو.

پێغەمبەر فەرمووی: «رۆژی پەسڵان هەژار دێنن، هەروەک چۆن خەڵکی داوای لێبوردن لە یەکتر دەکەن، پەروەردگار داوای لێبوردنی لێ دەکا، دەڵێ: "بەندەی من! لەبەر بێ فەڕیت نەبوو دونیام لێت قەدەغە کرد، بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو تا گەورەیی و خەڵاتی خۆمت پێ بدەم. ئێستا بڕۆرە نێو ریزی خەڵکەوە، هەرکەس لەبەر من خواردنێکی پێ دای، جلکێکی دەبەر کردی، دەستی بگرە و بیهێنە دەرەوە، بە تۆی دەبەخشم". خەڵک ئەو رۆژە نوقمی ئارەقن. ئەمیش دەڕواتە نێو ریزی

---

[1] ـ (قورئان، ٢٠/١٣١).

[2] ـ خوزگە بە تۆ کە رەدووی چاکان کەوتووی.

خەڵکەوە، هەرکەس چاکەیەکی دەگەڵ کردبێ دەستی دەگرێ و دەیهێنێتە دەرەوە"». دیسان گوتی: «دەگەڵ هەژاران ببنە دۆست و پێوەندیتان لەگەڵیان بێ، چونکە دەوڵەمەندییان لە بەرەڕووە». گوتیان: «ئەوە چییە؟» فەرمووی: «هەر بڕواداری لە دونیادا پاروە نانێ، یان قومە ئاوێکی پێ دابن، لە پەسڵاندا دەستی دەگرن و دەیبەنە نێو بەهەشتەوە».

عەلی دەگێڕێتەوە کە: «پێغەمبەر فەرمووی: "هەرگا خەڵکی پەرژانە سەر کۆوەکردنی دونیا و ماڵوسامان و هەژارانیان بە دوژمن زانی، پەروەردگار بە چوار شتیان تووشیار دەکا: سیاساڵ، ستەمی سوڵتان، خەیانەتی دادوەران‌و گەورەیی‌و دەسەڵاتی کافران و دوژمنان"».

ئیبنی عەبباس دەڵێ: «لەحنەتی خودای بەردەکەوێ ئەوەی کە بە بۆنەی هەژاریوە خۆی بە خوار بزانێ و لە سۆنگەی دەوڵەمەندییەوە خۆی بەرز رابگرێ».

دەڵێن لە هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا وەکوو کۆڕی سەفیانی سەوری دەوڵەمەندان سووک نەبوون، چونکە لە خوارەوە رایدەگرتن و نەیدەهێڵا بێنە پێشەوە، کەچی هەژارانی زۆر ڕێز لێدەنان.

لوقمان بە کوڕەکەی گوت: «کوڕم! ئەوەی جلکی پەڕپووتی دەبەرە، بە سووکی مەزانە، چونکە خودای تۆ و ئەو یەکێکە».

یەحیای کوڕی مەعاز گوتی: «داماو کوڕی ئادەم! گەر ئەوەندەی لە هەژاری دەترسێ لە دۆزەەبترسایە، لە هەر دوویان رزگار دەبوو؛ گەر ئەوەندەی لە دووی دونیایە، بە دووی بەهەشتدا بایە، بە هەردووکیان دەگەیشت؛ گەر ئەوەندەی لە رواڵەتدا لە خەڵک دەترسێ لە دەروونێدا لە خوا بترسایە، هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژدا بەختەوەر دەبوو».

کابرایەک دە هەزار درهەم پارەی هێنایە لای ئیبراهیمی ئەدهەم، لێی نەستاند، زۆری پێداگرت، ئیبراهیم گوتی: «دەتەوێ بەم پارەیە ناوی خۆم لە ریزی هەژاراندا بسڕمەوە، قەد واناکەم».

پێغەمبەر بە عایشەی گوت: «گەر دەتەوێ لە ڕۆژی پەسڵاندا بمبینیەوە، هەژارانە بژی، لە دانیشتن دەگەڵ دەوڵەمەندان خۆت بپارێزە و هیچ جلکێک دەبەر مەکە تا پینە نەکرێ».

## هێژایی هەژاری و چاوتێری

پێغەمبەر فەرمووی: «خۆزگە بەوەی ڕێیاندا بێتە نێو ئیسلام و بە قەدەر نیازیان پێ داو بەوە چاوی تێر بوو».

بە هەژارانی گوت: «لە دڵەوە بە هەژاری خۆتان ڕەزابن، تا پاداشی هەژاریتان بەر کەوێ، ئەگینا ناتانکەوێ». ئەمە هێمایە بەوەی کە هەژاری چاوچنۆک پاداشێ نابا، بەڵام خەبەری راشکاو هەیە بۆ ئەوەی کە ئەویش پاداشی هەیە.

دیسان فەرمووی: «هەر شتێک کلیلێکی هەیە، کلیلی بەهەشت دۆستایەتی هەژارانی پشوودرێژە.

ئەمانە رۆژی پەسڵان هاونشینانی پەروەردگارن». هەروەها گوتی: «دۆستترین و خۆشەویستترین بەندەی پەروەردگار، هەژارێکە کە بەوەی هەیەتی چاوتێرە و لەو رۆزییە کە پەروەرێنەری دەیکاتە بەشی، رازییە». دیسان گوتی: «سبەی لە رۆژی پەسلاندا هیچ هەژار و نەدارێ نییە کە نەڵێ بریا لە دونیا پتر لە بژیوم دەس نەکەوتایە». پەروەردگار وەحی نارده سەر ئیسماعیل و پێی گوت: «لە لای دڵ شکاوان بۆم بگەڕە». گوتی: «پەروەرندەم! ئەمانە کێن؟» گوتی: «هەژارانی راستبێژ».

پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەردگار رۆژیپەسڵان دەڵێ: "بەدووی بژاردەو بەرکەتییەکانمدا بگەڕێن". فریشتەکان دەڵێن: "پەروەردگار! ئەوانەکێن؟" دەڵێ: "هەژارانی موسوڵمان کە بەوەی من لە چارەیاندا نووسیومە رەزا بوون، هەموویان بەرن بۆ بەهەشت". دەیانبەنە نێو بەهەشت، لە کاتێکدا هەموو خەڵکی چاوەنوارێ پێراگەیشتنن».

بوودەردا دەڵێ: «ئەوەی بە زۆربوونی ماڵی دونیای شاد بێ و بە کەمبوونەوەی تەمەنی خەمبار نەبێ، لە ئاوەزیدا نوقسان هەیە. ئەی پەروەردگاری بێخەوش! چ خێرێک لەوەدایە کە دونیای کەسێک زۆر بێ و تەمەنی کەم بێتەوە؟»

یەکێک بە لای عامر کوڕی عەبدی قەیسدا تێدەپەڕا. دی کە نان و کەورگ دەخوا، گوتی: «ئەی عامر! لە هەموو دونیا بەمە قنیاتت کرد». گوتی: «من کەس دەناسم کە بە کەمتر لەمە قنیاتی کردووە». گوتی: «ئەوە کێهە؟» گوتی: «ئەوەی دونیای لەباتی دوارۆژ ئەستاندووە، بە کەمتر لەمە قنیاتی کردووە».

رۆژێک ئەبووزەری غەففاری دانشتبوو و دەگەڵ خەڵکی قسەی دەکرد. ژنەکەی هات و گوتی: «تۆ لێرە دانشتووی، سوێند بە خودا کە هیچ شت لە ماڵتدا نییە». گوتی: «ژنەکەم زەردوماهێکی[1] رژدمان لە پێشە، ئەوەی باری سووک نەبێ ئەو رێگایە پێ نابرێ». ژنەکەی رەزا بوو و گەڕایەوە.

**سەرنج:**

بزانە رای جیاواز هەیە لەسەر ئەوەی کە هەژاری پشوودرێژ هێژاترە یان دەولەمەندی شوکرانەبژێر. بەڵام راستەکەی ئەوەیە کە هەژاری پشوودرێژ سەرتر و هێژاترە و سەرجەمی ئەم خەبەرانە، بەڵگەن بۆ ئەم راستییە. بەڵام گەر دەتەوێ لە نهێنی کارەکان بگەی، ئەوەیە کە هەرچی تەگەرە بخاتە نێو یاد و خۆشەویستی پەروەردگار دزێو و کرێتە. کەس هەیە هەژاری بۆی دەبێتە کۆسپ و کەسیش هەیە دەولەمەندی تەگەرەی تێدەخا.

---

١- زەردوماهـ: کێوی بەرز و سەخت.

شرۆڤەی ئەمە ئەوەیە کە چاتر وایە هەرکەس بە قەدەر نیازی خۆی هەبێ، چونکە ئەم رادەیە هی دونیا نییە و توێشووی رێگای دوارۆژە. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرێنەرم! بژیوی بنەماڵەی محەممەد دابین کە»؛ بەڵام هەرچی پتر لەوەیە، نەبوونی چاترە؛ چونکە لە چاوچنۆکی و چاوتێریدا هەردوو حاڵیان وەکوو یەکە، چ هەژاری چاونەزێر، چ دەوڵەمەندی چاوچنۆک، هەردوویان خۆیان بە دونیاوە هەڵواسیوەو چاوچنۆکانە پەرژاونەتە سەری.

بەڵام هەژار، تایبەتمەندییە مرۆییەکانی پێخوست دەکرێن و تووشیاری ئازارێ دێ کە دونیای لەبەر چاو کرێت دەکا. مرۆڤی باوەڕدا بەو رادەیە کە دۆستایەتی دونیای لە دڵ کەم دەبێ، خوای لە دڵدا خۆشەویست دەبێ و کە دونیا بوو بە زیندان بۆی، لە گیانەڵادا دڵی کەمتر ئاوڕ لە دونیا دەداتەوە. دەوڵەمەند کە لە دونیا بەهرەی وەرگرت و بوو بە هۆگری و خووی پێوە گرت، دووری لێی بۆی ئەستەمەو لە سەرەمەرگدا گەلێک جیاوازی هەیە لە نێوان ئەم دوو دڵەدا، تەنانەت لە کاتی پەرستن و عیبادەتیشدا جیاوازی هەیە، چونکە ئەو چێژەی هەژار لە عیبادەت دەیبا، قەد دەوڵەمەند نایبا و یادکردنی دەوڵەمەند سەرزارەکی و رواڵەتییە. تا دڵ بریندار و پێخوست نەکرابێ و تووشی رەنج و سووتان نەبووبێ، چێژی یادی خودا لە ناخیدا رۆناچێ.

هەروەها گەر هەردوویان لە چاوتێریدا بەرانبەر بن، هەژار هێژاتر و سەرترە. بەڵام گەر هەژار چنۆک بێ و دەوڵەمەند شوکرانەبژێر و چاوتێر بێ و کاتێ ماڵی لێ دابڕا زۆر بۆی پەرۆش نەبێ و دیسان خەریکی سپاسی خودا بێ، دڵی بە سپاس و چاوتێری پاقژ دەبێ؛ هەروەها دڵی هەژاری چاونەزێر بەو چنۆکیەی ڕمووده دەبێ، بەڵام بە رەنج و ئازاری هەژاری پاقژ دەبێتەوە، بەم چەشنە لێکتر نزیک دەبنەوە. لە راستیدا دووری و نزیکی بە پەروەردگار بە قەدەر دابڕان و نزیکی بە دونیایە.

گەر دارایەک دڵی ڕموودەی سامانی نەبێ و بوون و نەبوونی بۆی وەکوو یەک بێ و ئەوەی هەیەتی بۆ پێکهێنانی نیازی خەڵکی خەرجی کا، وەکوو عایشە کە بە رۆژێک سەد هەزار درهەمی خەرج کرد و لە بیری نەبوو یەک درهەم بدا بە گۆشت بۆ خۆی تا رۆژووەکەی پێ بکاتەوە، ئەم پلە، لە پلەی هەژارێ کە دڵی وا نییە، سەرتر و هێژاترە. بەڵام گەر دۆخەکان بەرانبەر بن، هەژاری پشوودرێژ هێژاترە؛ چونکە زۆربەی کاری دەوڵەمەند ئەوەیە کە سەدەقە و خێربدات. لە خەبەردا هاتووە کە هەژاران لە لای پێغەمبەر گلە و گازندەیان دەکرد کە «دەوڵەمەندان خێری دونیا و دوارۆژیان بردووە، چونکە سەدەقە و زەکات دەدەن و حەج و خەزا دەکەن و ئێمە ناتوانین». پێغەمبەر نوێنەری هەژارانی -کە هاتبووە لای- لاواندەوەو فەرمووی: «"مرحَباً بِکَ وَ بِمَن جِئتَ مِن عِندِهِم"[1]؛ لە لای هۆزێکەوە هاتی کە من گەلێک خۆشیانم دەوێ؛ پێیان بڵێ هەرکەس لەبەر خاتری خودا لەسەر

---

1 ـ مەرحەبا لە خۆت و لەو کەسانەی کە لە لایانەوە هاتووی.

هەژاری پشوودرێژ بێ، خوا دانستەیەکیان دەداتێ کە دەوڵەمەندان نییانە: لە بەهەشتدا کۆشک هەیە کە بەهەشتیەکان وا سەیری دەکەن کە خەڵکی سەرزەوی سەیری ئەستێران دەکەن، ئەو کۆشکانە جێگای پێغەمبەران و هەژاران و شەهیدانن؛ دووەم ئەوەیە کە هەژاران پێنجسەد ساڵ زووتر دەڕۆنە نێو بەهەشتەوە؛ سێیەم ئەوەیە کە کاتێ هەژارێ دەڵێ سُبحانَ اللهِ وَ الحَمدُ للهِ وَ لا اِلهَ الاَّ اللهَ وَاللهُ اَکبَر، هاوکات لەگەڵ ئەوە، دارایەکیش هەر ئەوە بڵێ و لەگەڵ ئەوەش دەهەزار درهەم بە سەدەقە بدات، قەد ناگاتە ئاستی ئەو هەژارە». هەژارەکان گوتیان: «رازی بووین- رازی بووین». بۆیە ئەمەی گوت، چونکە یادی خوداکردن توویەکە کە گەر لە دڵێکی هەژاری خاڵی لە دونیا و شکاو و خەمباریدا بچێنرێ، تێیدا کاریگەر دەبێ. کەچی بەسەر دڵی دارایەکدا کە بە دونیا شادوشوکورە، وەکوو تیرێک بدا لە بەرد، کەوانە دەکاو دەگەڕێتەوە. کەواتە، چونکە پلە و پاگەی هەرکەس بە قەدەر نزیکی و پەرژانە سەر یاد و خۆشەویستی خودایە و ئەو خەریکبوونەش بە قەدەر رزگاربوونە لە گراوی دونیا و دڵی داراش لەو رمووەدەییە بێبەش نییە، کەی عیبادەتی هەژار و دارا وەکوو یەکن.

هەروەها بۆی هەیە کە دەوڵەمەندێک وا بزانێ کە لە نێوان ماڵوساماندایە و هۆگری ماڵەکەی نییە؛ ئەمەش خۆ فریودانە. کاتێ دەتوانێ وا بڵێ کە وەکوو عایشە، هەرچی هەیە بە بێ رامان دابەشی کا، هەر وەکوو خۆڵ. گەر ئەمە ئاسان بایە و بۆ هەموو کەس بلوایە کە بەبێ هۆگربوون، خەریکی کاری دونیا بێ، بۆچی پێغەمبەران ئەوەندە خۆیان لێ دەبوارد و دوورەپەرێزیان لێ دەکرد و دەیانگوت ئێوەش وا بکەن؟ تەنانەت پێغەمبەر دەیفەرموو: «دوور بێ لە من! دوور بێ لە من!»، چونکە دونیای بۆ دەهاتە پێش چاو و خۆی پێ دەنواند.

عیسا دەڵێ:«سەیری ماڵی دونیا مەکەن، چونکە تیشکی شرینیەکەی برواتان دەدۆڕێنێ». بۆیە ئەمەی گوت، چونکە کە ئەو شیرینیەی بۆ هاتەدی، شیرینی عیبادەتی لێ تاڵ دەکا، چونکە دوو شرینی پێکرا لە دڵێکدا کۆوەنابن.

بوون، زۆرتر لە دوو شت نییە: خودا و ناخودا. کە دڵت بە ناخودا بەست، بەو رادەیە لە خودا دوور دەبییەوە؛ بەو رادەش کە لە ناخودا دوور دەبێتەوە، لە خوداوە نزیک دەکەوێ. ئەبووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «ئەو هەناسە ساردەی کە هەژار لە کلتی پێک نەهاتنی ئاواتیدا هەڵیدەکێشێ، هێژاتر و سەرترە لە هەزار ساڵ پەرستنی بەردەوام». یەکێک بە بێشری حافی گوت: «دوعایەکم بۆ بکە، خێزانبارم و هیچم نییە». گوتی: «کاتێ خێزانەکەت پێت دەڵێن نانمان نییە، ئاومان نییە و تۆ لە پێکهێنانی داخوازیان دادەمێنی و ئەم خەمەت لە دڵدا پەنگ دەخواتەوە، لەو دەمەدا دوعایەکم بۆ بکە؛ دوعای تۆ لەو کاتەدا لە دوعای من سەرترە».

## داب و نەریتی هەژاری

بزانە، دام و دەستووری هەژاری ئەوەیە کە لە دڵدا ڕەزابی و لە ڕواڵەتدا گلەیی نەکەی. لە دەروونیدا سێ دۆخی هەیە:

دۆخی **یەکەم**: ئەوەیە کە بەم هەژارییەی شادومان بێ و بزانێ ئەمە بەزەیی خودایە کە تەنیا لەگەڵ دۆستانی خۆیدا دەیکا.

**دووەم**: ئەوەیە کە گەر شوکرانەبژێری هەژاری نەبێ، بەڵام کاری خوداش بە کرێت نەزانێ، هەرچەند هەژاری بە دزێو بزانێ. هەروەک کەسێک کە بۆ خۆی حەجامەت دەکا، ئەو ژانی حەجامەتەی پێ ناخۆشە، بەڵام حەجامەتکەری پێ خراپ نییە؛ ئەمەش هەر گەورەیە.

**سێیەم**: ئەوەیە لە پەروەردگار نارەزابێ بە بۆنەی ئەم هەژارییەوە، ئەمە حەرامە و پاداشی هەژارییەکەی پووچەڵ دەکاتەوە؛ چونکە دەبێ لە هەمووکاتدا ئارخەیان بێ کە پەروەردگار ئەوەی شیاو و لەبارە دەیکاو خراپە لە پەروەردگار بە دوورە. لە ڕواڵەتیشدا دەبێ پەردەی پشوودرێژی نەدرێ و گلە و گازندە نەکا.

عەلی دەڵێ: «هەژار هەیە کە لە ریزی ئەوانەیە کە سزا دەدرێن، هۆکەشی ناو چاوگرژی و گلە و گازندە و تووڕەبوونە لە ویستی پەروەردگار. ڕەنگە لە ریزی بەختەوەرانیشدا بێ، نیشانەکەشی رووخۆشی و سپاس‌کردن و پێزانین و گلەیی نەکردنە». لە خەبەردا هاتووە کە شاردنەوەی هەژاری، گەنجێکی زۆر گەورەیە.

**نەریتیتر**: ئەوەیە کە دەگەڵ دەوڵەمەندان تیکەڵاوی نەکاو ڕێزیان لێ نەگرێ و خاکەسار نەبێ و زمان لووسییان بۆ نەکا. سەفیان دەڵێ: «کە هەژار بە دەوری دەوڵەمەنداندا سووڕایەوە، بزانە زمان‌لووسە و گەر بە دەوری سوڵتاندا بوو، ئەوە دزە».

**نەریتیتر**: ئەوەیە کە برێ جار ئەوەی پێی دەکرێ بیداتە سەدەقەو لە خۆی دووری کاتەوە. پێغەمبەر فەرمووی: «درهەمێ هەیە کە ڕەنگە بکەوێتە بەر سەدهەزار درهەمەوە». گوتیان: «لە کوێ؟» فەرمووی: «پیاوێ کە دوو درهەمی هەیە و درهەمێکی بە سەدەقە دەدا. ئەمە هێژاترە لەو کەسەی کە سامانی زۆری هەیە و سەد هەزار درهەم بە خێر دەدا».

**نەریتی نەستاندنی سەدەقە**: ئەوەیە کە هەرچی دەگەڵ لێڵی تێکەڵاو بێ و هەرچی زۆرتر لە نیازی بێ، وەرینەگرێ. هەروەها گەر لە نێو خەڵکدا وەریبگرێ و لە نهێنیدا دابەشی کا، ئەمە ئاستی ڕاستبێژانە؛ گەر ئەمەی پێناکرێ، بیداتەوە بە خودانی ماڵ و پێی بڵێ بیداتە نیازمەندێک.

هەروا گرینگە کە مەبەستی سەدەقەدەر بزانێ. ئەوە یان دیارییە یان سەدەقە و یاخۆ دوڕازییە.

ئەوەی دیاری بێ، ئەستاندنی سوننەتە، چونکە هیچ منەتی تێدا نییە. ئەگەر زانی هەندێکی منەتی تێدایەو هەندێکی نە، ئەو ئەندازەی کە بێمنەتە وەربیگرێ و ئەویتری نە. کابرایەک رۆن و کەشک و مەڕێکی بۆ پێغەمبەر هێنا. مەڕەکەی داوەو ئەوانی‌تری وەرگرت. کابرایەک پەنجا درهەمی بۆ فەتحی مووسلی هێنا. گوتی: «لە خەبەردا هاتووە کە هەرکەس بێ داواکردن شتێکی بۆ بێنن و بەسەر خاوەنەکەیدا بیداتەوە، وەکوو ئەوەیە دەستی خودای دابێتە دواوە». درهەمێکی هەڵگرت و ئەویتری پێ داوە. حەسەنی بەسریش هەر ئەم حەدیسەی گێڕاوەتەوە. بەلام رۆژێک کابرایەک کیسەیەک زێڕ و چەن جلکێکی بۆ برد، وەرینەگرت و گوتی: «ئەوەی کۆڕی دەرس دابنێ و لە خەڵکی شت وەرگرێ، رۆژی پەسلان خودا نابینێ و هیچ بەشێکی پێناگا». بۆیە لێی نەستاند، چونکە مەبەستی لەو کۆڕانە، پاداشی خوا بوو؛ زانیبووی کە ئەو دیاریەی بە بۆنەی کۆڕەکەوە هێناوە، نەیویست پاداشەکەی پووچەڵ بێتەوە. یەکێک دیارییەکی بۆ دۆستێکی هێنا، گوتی: داینە و بڕوانە، گەر ئەوەت لێ بستێنم لە لات بە نرختر دەبم، تا وەریبگرم. سەفیانی سەوری هیچی لە کەس نەدەستاند، دەیگوت گەر دڵنیا بایەم کە نایگێڕنەوە، لێم دەستاندن. واتە خۆیان هەڵدەکێشن و منەت دەنن. کەس بووە کە لە دۆستانی تایبەتی ئەستاندووە و لە کەسانی‌تری وەر نەگرتووە: هەموویان لە منەت خۆیان بواردووە. بێشری حافی دەڵێ: «بێجگە سری سەقەتی داوای هیچم لە کەس نەکردووە، چونکە زانیومە چەن پارێزکارە و چەن شاد دەبێ کە شتێکی لە دەست دەربهێنرێ».

بەلام گەر کەسێک بە مەبەستی رووبینیوە شتێک ببەخشێ، نەستاندنی گرینگترە. یەک لە گەورەکان دەستی کەسێکی گێڕایەوە، لۆمەیان کرد. گوتی ئەوە میهرەبانیەک بوو دەگەڵیانم کرد، چونکە دەیانگێڕایەوەو هەم شتەکەیان لە دەست دەردەچوو، هەمیش پاداشیان بەر نەدەکەوت.

کە بە مەبەستی سەدەقەوە درا، گەر شیاوی سەدەقە نەبوو، وەرینەگرێ. بەلام گەر ئاتاجی پێ بوو، رەوانییە وەرینەگرێ. لە خەبەردا هاتووە کە هەرکەس بێ داواکردن شتێکی پێ بدرێ، ئەوە رسقێکە خودا پێی داوە. هەروەها دەڵێن: «ئەوەی شتێکی پێ بدەن و وەرینەگرێ، رۆژێک وا تووش دەبێ کە شتێکی بوێت و پێی‌نەدرێ». سری سەقەتی هەر چەن ماوە شتێکی دەنارد بۆ ئەحمەدی حەنبەڵ؛ نەیدەستاند. گوتی: ئەحمەد! خۆ ببوێرە لە زیانی رەت‌کردنەوە. گوتی: جارێکی‌تر بیڵێوە؛ گوتیەوە. نەختێ راما، پاشان گوتی: «بە قەدەر یەک مانگم هەیە، ئەمە راگرە، کە تەواو بوو، لێت دەستێنم».

**شرۆڤەی ئەوەی کە دەرۆزەیی بە بێ نیاز حەرامە**

بزانە، پێغەمبەر فەرمووی: دەرۆزەیی سهێتە و شتی سهێت تا پێویست نەبێ، رەوا نییە. هۆی

کرێتبوونی ئەوەیە کەسێ کاری خراپی تێدایە:

**یەکەم** ئەوەی کە ئاشکراکردنی هەژاری گلە و گازندەیە لە پەروەردگار. ئەگەر خولامی کەسێک لە کەسێکیتر داوای شتێ بکا، تیزی لە خودانی خۆی داوە. کەفارەی ئەمەش ئەوەیە تا ناچار نەبێ هیچ نەڵێ و گەریش گوتی بە نیازی گلە و بناشت نەیڵێ.

**دووەم** ئەوەیە کە خۆی خوار و سووک کردووە، بڕواداریش بۆی نییە بە لای کەسێک بێجگە لە خوداوە خۆی خوار بگرێ.

بۆ ئەمەش دەبێ تا پێی دەکرێ لە دۆست و کریف و دلاوایەک داوا بکا کە گەر دەستی بۆ ڕاکێشان بە سووکی سەیری نەکەن؛ هەروەها لەو کەسانەش تا زۆر ئاتاجی نەبێ، داوا نەکا.

**سێیەم**، ڕەنگە لەو داواکردنە، کەسی داوالێکراو بڕەنجێ؛ چونکە ڕەنگە ئەو کەسە لەبەر شەرم و شوورەیی و ڕووبینی یارمەتی بدا، چونکە لە لۆمەی خەڵکی دەترسێ. کەواتە گەر بیدا، پێی ناخۆشە و بەدڵ نایدا؛ گەریش نەیدا تووشی شەرم و شوورەیی و لۆمەی خەڵک دەبێ. بۆ ئەمەش دەبێ بە ڕاشکاوی نەیڵێ، بەڵکوو دەبێ بە هێماوە تێیبگەیێ؛ بە چەشنێ کە گەر ئەو کەسە پێیخۆش نەبێ، بتوانێ خۆی لێ ببوێرێ. گەریش بە ڕاشکاوی گوتی، دیاری نەکا کە چی دەوێ. مەگین ئەوەی کەسێکی دەوڵەمەند بێ و بزانێ زەکاتی لەسەر فەرزە، لەم کاتەدا ڕەوایە، هەرچەند تووشی ئازاریش بێ؛ چونکە خۆی زەکاتی بۆ دەشێ. هەروەها گەر دەوڵەمەند بێ و زۆرکەس چاویان لێ بێ و گەر نەیدا سەرکۆنە بکرێ، ئەمەش وەکوو ئەوەیە کە گوتمان نابێ دیاری بکرێ. بەڵام گەر زەکاتەکەی بۆ کەسێکیتر ویست کە زەکاتی بۆ دەشێ و زەکاتدەریش، زەکاتدانی لەسەر فەرزە، ڕەوایە، هەرچەند دڵی ئەو کەسە بڕەنجێ؛ گەر خۆیشی شیاوی وەرگرتنی زەکات بوو، هەروا. بەڵام ئەوەی کە لە ترسی لۆمە و تیز و تانەی خەڵکی یان لەبەر شەرم و شوورەیی بدرێ، وەرگرتنی حەرامە، چونکە وەکوو داگیرکردن و بەتاڵانبردنە. لە فتوادا سەرنج بە ڕواڵەتی زمان دەدرێ؛ بەڵام ئەوە بە کەڵکی ئەم جیهانە دێ. کەچی لەو دونیادا سەرنج بە فتوای دڵ دەدرێ؛ کە دڵ شایەتی دا بە نابەدڵی داویە، حەرامە.

بەمەی بێژرا خویان بوو کە پارسەکی حەرامە، مەگین زۆر نیاز بێ یا کارێکی گرینگ بێ. گەر بۆ خەملاندن و ڕابواردن و خوەشخواردن یاخۆ بەرگی بەدەو دەبەرکردن بێ، ناڕەوایە. بۆ کەسێک ڕەوایە کە ناتوان بێ و هیچ شتی نەبێ و هیچ کاری پێ نەکرێ، یاخۆ خەریکی فێربوونی زانست بێ و بە کارکردن، لە خوێندن و فێربوون ڕابمێنێ. بەڵام گەر تەنیا خەریکی عیبادەتە، دەرۆزەیی ناڕەوایە، بەڵکوو کەسبوکاری لەسەر فەرزە. گەر خواردنی نیازە و کەچی لەماڵەوە کتێبێکی هەیە کە هیچ پێویستی پێی نییە، یان بەرماڵێکی زیادی هەیە، یاخۆ سیپاڵێکی هەیە، دەرۆزەیی لەم کاتەدا حەرامە

و دەبێ پێشتر ئەو شتانە بفرۆشێ و خەرجیان کا. بەلام گەر کەسێک گەدایی کا بۆ ئەوەی خۆی و منداڵی بە خۆشی رایبوێرن، ئەمەش حەرامە. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەی شتێکی بێ و دەرۆزەیی کا، کە رۆژی پەسڵان رادەگا، روومەتی بووەتە ئێسک و گۆشتی پێوە نەماوە». دیسان گوتی: «ئەوەی هەیەتی و داوا دەکا، ئەوە ئاوری دۆزەخە دەسووتێنێ، جا چ کەم بێ و چ زۆر».

لە پێغەمبەریان پرسی: «دەبێ چەندت بێ تا پارسەکی نارەوا بێ؟» لە خەبەرێکدا هاتووە کە «چاشت و شیو»، لە خەبەرێکی‌تردا «پەنجا درهەم». بەلام ئەوەی کە گوتوویە پەنجا درهەم، واتای ئەم پەنجا درهەمە زیو یا هەر شتێکی‌ترە کە بایی پەنجا درهەم بێ و بۆ کەسێک کە تەنیا بژی، بەشی یەک ساڵی دەکا. کە ئەم ئەنازەیە نییە و لەو باژێرەدا واباوێ کە کاتی سەدەقەدان و زەکات-دان پێکەوە بێ، گەر نەیەوێ کە سەرلەبەری ساڵەکەی نسک و ناهمێ بمێنێتەوە، ئەم رادەیە داوا بکا رەوایە. بەلام چاشت و شیو بۆ کەسێک بێژراوە کە هەموو رۆژێ دەرۆزەیی دەکا، رۆژ بۆ ئەم وەکوو ساڵە بۆ کەسانی‌تر.

نیازی سەرەکی سێیانە: جلک و خانوو و خۆراک. پێغەمبەر فەرمووی: «فرزەندی ئادەم لە دونیادا هیچ مافێکی نییە، مەگین لە سێ شتدا: خۆراکێک کە پشتی راست راگرێ، جلکێ کە شەرمگای داپۆشێ و خانوویەک کە تێیدا دابنیشێ؛ ئەوەش لە کەلوپەل کە نیازی ژین بێ، هەر لەسەر ئەوانەیە». گەر لبادە و حەسیری هەیە نابێ بۆ بەرە دەرۆزەیی کا. گەر دەفرە گلێنەی هەیە، نابێ بۆ دەفری مسین گەدایی کا. دەبێ تا نیازێکی گرینگی نەبێ، کاری کرێت و نالەبار نەکا.

سەرنج -**ئاستی هەژاران**

ئاستی هەژاران جۆر بە جۆرە. بێشری حافی دەڵێ هەژاران سێ ئاستیان هەیە:

**یەکەم** ئەوەی کە داوا ناکاو گەریش بیدەنێ وەرینەگرێ. ئەم تاقمە لەگەڵ رۆحانیەکان لە بەرزترین شوێنی بەهەشتدان.

**دووەم** ئەوەی کە داوا نەکا، بەلام گەر پێی بدەن، وەریدەگرێ. ئەمە لە بەهەشتدا دەگەڵ نزیکانی دەرگانەی خوایە.

**سێیەم** ئەوەی کە داوا دەکا، بەلام بە گوێرەی نیازی. ئەمە لە یارانی دەستی راستە (اصحاب الیمین).

ئیبراهیمی ئەدهەم لە شەقیقی بەلخی پرسی: «هەژارانی شاری خۆتت چۆن بەجێ هێشت؟» گوتی: «بە باشترین حاڵ؛ ئەگەر بیانبێ شوکرانەبژێرن و گەریش نەیانبێ پشوودرێژی دەکەن». ئیبراهیم گوتی: «منیش سەگەکانی بەلخم وا بەجێ‌هێشت». شەقیق گوتی: «دەی هەژارانی ئێوە

چۆنن؟» گوتی: «گەر نەیانبێ شوکرانەبژێرن و گەریش بیانبێ دەیبەخشن». روومەتی ئیبراهیمی رامووسی و گوتی: «راستیەکەی هەر ئەمەیە».

یەکێک دەگێڕێتەوە کە: «ئەبولحەسەنی نووریم بینی کە دەستی راکێشاوە و دەرۆزەیی دەکا، زۆرم پێ سەیر بوو، بە لای جونەیدەوە گوتم. جونەید گوتی: "پێت وا نەبێ دەستی هەڵبڕیوە تا داوای شتێ لە خەڵک کا، بەڵکوو داوا لە خوا دەکاو دەیەوێ خەڵک بە سەدەقەدان، چاکەیان بەرکەوێ، بۆ ئەو هیچ زیانی نییە". پاشان جونەید گوتی: "برۆ کێشانەیەک بێنا". رۆیشتم و هێنام. سەد درهەمی کێشا و پاشان لاگوێلێ زێڕی بە سەردا کرد، گوتی: "ئەمە ببە بۆ نووری و پێی بدە". زۆرم پێ سەیر بوو کە زێڕەکەی کێشا تا قورساییەکەی روون بێتەوە، کەچی لە خۆڕا مستێ زێڕی بە سەردا کرد. بردم بۆ نووری. نووری گوتی: کێشانەیەکم بۆ بێنە. بۆم هێنا، سەد درهەمەکەی کێشاو گوتی: "ئەمەی پێ بدەوە"و ئەویتری هەڵگرت. گوتی: "جونەید پیاوێکی هۆزانە، دەیەوێ گورێسەکەی لە دوو سەرەوە بگرێ". فرەتر سەرم سووڕ ما، تا بردمەوە بۆ جونەید و بۆم گێڕاوە. گوتی: "اَللهُ المُستَعانُ، ئەوەی هی ئەو بوو هەڵیگرت و ئەوەی هی خۆم بوو گێڕایەوە". پرسیم ئەمە چ بوو؟ گوتی: "ئەو سەد درهەمە بۆ پاداشی رۆژی پەسلان بوو، ئەوەش لێم زیاد کرد بۆ رەزای خودا بوو. نووری ئەوەی بۆ خودا بوو هەڵیگرت، ئەوەش کە بۆ خۆم دابووم، گێڕاوە"». هەژارانی ئەو سەردەمە چونکە وا بوون، دڵگەلیان پاک و بێخەوش بوو و بەبێ پەیڤین لە نهێنی دڵی یەکتر ئاگادار بوون. گەر کەسێک بەم چەشنە نەبوو، با کەمتر لەوە نەبێ کە تامازرۆی گەیشتن بەم ئاستەیە. گەریش وا نەبوو، با باوەڕی بەم سەربهوردە بێ.

## شرۆڤەی راستەقینە و هێژایی پارێزکاری

گەر کەسێک سەهۆڵی بێ و بە جوانی رایبگرێ تا لە رۆژی گەرم و بەتینیدا ئاوی پێ سارد کاتەوە، کەسێکیتر بێ و لە هەمبەر زێڕدا لێی بکڕێ، چنۆکیەک کە بۆ سەهۆڵەکە بووی، بۆ زێڕەکە دەگوێزرێتەوە؛ دەڵێ: رۆژێ بە ئاوی گەرم رایدەبوێرم، تەمەنێ بەم زێڕەوە ژینێکی خۆش و تەیار دابین دەکەم؛ ئەمەم بۆ چاکترە تا رۆژێک ئاوی سارد بخۆمەوە. ئەم گۆڕانەوەی سەهۆڵ بە شتێکی باشتر لەوە، پێی دەڵێن خۆبواردن لە سەهۆڵ. بارودۆخی خواناس لە دونیادا هەروایە، چونکە دەزانێ دونیا لە بواردایە و بەردەوام تێدەپەڕێ و دەتوێتەوەو بە مردن، دوایی دێ. کە دەبینێ دوارۆژ پاک و بێخەوشەو نە تێدەپەڕی و نەدوایی دێ و تەنیا لە بەرانبەر دنیاوە دەیفرۆشن، دونیا لە پێش چاوی سووک و بێنرخ دەبێ و لەگەڵ دوارۆژ دەیگۆڕێتەوە؛ چونکە دوارۆژ زۆر بەنرخترە. بەم دۆخە دەڵێن پارێزکاری. بە مەرجێ ئەم پارێزکارییە لە موباحەکانی دونیا بێ؛ بەڵام خۆبواردن لەو شتانەی بەگریان

لێ کراوە، فەرز و پێویستە. هەروەها دەبێ دەسدار و بەبرشت بێ؛ چونکە ئەوەی کە دەسەلاتێکی بەسەر دونیاوە نییە، خۆ لێبواردنی بێ واتایە، مەگین ئەوەی پێی بدەن و بۆی راینێن و توخنی نەکەوێ، بەلام ئەمە تا تاقی نەکرێتەوە، ئاشکرا نابێ؛ چونکە دەسەلاتی دلیش دەگۆڕێ و نەفس سەربزیو دەکاو ئەم بیر و بۆچوونە هەلەیە، دەگۆڕێ. مەرجیتر ئەوەیە کە ماڵوسامان و پلە و پاگەی رانەگرێ و لە دەستی بدا، چونکە پارێزکاری راستەقینە ئەوەیە کە نووکوبەدی خۆشییەکانی دونیا لە خۆ دوور بگرێ و لەگەل چێژی دوارۆژی بگۆرێتەوە.

ئەمە مامەلەیە، بەلام مامەلەیەکی زۆر بە قازانج، هەر وەک پەروەردگار فەرمووی: إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ.[1] پاشان گوتی: فَٱسْتَبْشِرُوا۟ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ.[2] پەروەردگار لەش و ماڵی برواددارانی بە بەهەشت کڕیوە و گوتوویە: ئەم سەودایەتان لێ پیرۆز بێ و پێی شادوشوکربن، چونکە قازانجی زۆری بۆتان هەیە. ئەوەش بزانە، هەرکەس بە هیوا و بە مەبەستی شتێ بێجگە لە دوارۆژ چش لە دونیا کا، ئەوە پارێزکار نییە.

هەروەها بزانە فرۆتنی دونیا بە بەهەشت، لە لای خواناسان، پارێزکارییەکی زۆر بچووکە. بەلکوو خواناس ئەوەیە کە ئاوڕ لە بەهەشتیش نەداتەوە، هەروەک چۆن چشی لە دونیا کردووە، چونکە بەهەشتیش بەشی شاوەتی چاو و زگ و شەرمگایە.

دەبێ خۆی سەرتر بەوە بزانێ کە بۆ ئاستی چوارپێ و درندان دابەزێ، چونکە هەرچی ئارەزووی نەفس دابین کا، لە نێوان مرۆڤ و چوارپێدا هاوبەشە و نابێ ئاوڕ لەوە بداتەوە. دەبێ لە دونیا و دوارۆژ بێجگە لە خودا چیدی نەوێ و بە کەمتر لە ئەو قنیات نەکا و هەموو شتێ بێجگە لە خوای لە بەرچاو خیچ و خوار و نالەبار بێ. ئەمە پارێزکاری خواناسانە و ئەم کەسانە بۆیان هەیە لەبەر ماڵی دونیا هەلنەیەن و خۆی لێ نەبوێرن؛ بەلکوو دەتوانن بیستێنن و لەجێی خۆیدا خەرجی کەن و پێداویستی هەژارانی پێ پێک بێنن. هەروەک عومەر لە ئەو هەموو دارایی و ماڵوسامانەی لە ژێر رکێفیدا بوو، دلی رزگار بوو. وەکوو عایشە کە بە رۆژێ سەد هەزار درهەمی خەرج کرد و درهەمێکی بۆ کردنەوەی رۆژووەکەی خۆی دانەنا.

کەواتە، دەکرێ کەسێک سەدهەزار درهەمی بێ و پارێزکار بێ، کەچی کەسیتر درهەمێکی بێ و پارێزکار نەبێ. تەواوتر بوون ئەوەیە کە مرۆڤ نە لەبەر دونیا هەلبێ، نەش بکەوێتە دووی، نە رقی لێ بێ، نە رمووەدەی بێ، نە دەگەلی تەبا بێ، نەش ناتەبا بێ، بەلکوو دەبێ دلی لێ رزگار بێ و بیری لێ

---

١ ـ (قورئان، ١١١/٩) خودا گیان و سامانی باوەڕدارای کڕیوە و لە باتیدا دەیانخاتە بەهەشتەوە. (هـ)

٢ـ (قورئان، ١١١/٩) دەسا ئێوە بەو سەودایەو مزگێنی بە یەکتری بدەن، کە دەسکەوتێکی زۆر گەورەو دەسکەوتووە. (هـ)

نەکاتەوە؛ چونکە ئەوەی ببێتە دوژمنی شتێک، وەکوو ئەوەی کە دۆستیە دڵی پەرژاندۆتە سەری. تەواوبوون ئەوەیە کە دڵت لە هەرچی ناخودایە ئازاد بێ و تەنیا خودات لە دڵ بێ. دەبێ ماڵی دونیات لە لا وەکوو ئاوی زەریا بێ و دەستی تۆش وەکوو خەزانەی پەروەردگار بێ، کەم بێ یان زۆر، گەر بێت یان بڕوا لە لات وەکوو یەک بێ و دڵت لێی ڕەهابێ. تەواوبوون ئەمەیە، کەچی خۆ دەخاپێنن ئەوانەی کە ناتوانن چش لە ماڵی دونیاکەن و دەڵێن لە ماڵی دونیا ڕەها و ڕزگارین. گەر ئەمانە هەژارێ لە ئاوی دەریا هەڵگۆزێ یان لە ماڵی ئەمان ببا یان لە ماڵی کەسێکیتر، بۆیان تەوفیری هەبێ، ئەوا هێشتا دڵیان گراوی دونیایە و خۆشەویستی ماڵیان لە دڵدایە. کەواتە، گرینگ ئەوەیە واز لە ماڵ بێنێ و تا پێی دەکرێ لێێ هەڵبێ و دووری لێ بگرێ تا لە سیحری بیوەی بێ. یەکێک بە عەبدوڵلای موبارەکی گوت: «پارێزکار!». گوتی: «پارێزکار، عومەری عەبدولعەزیزە کە بەسەر ئەو هەموو ماڵەدا زاڵە و خۆی لێ دەپارێزێ. بەڵام من کە هیچم نییە، پارێزکاریم چ واتایەکی هەیە؟» کوڕی ئەبی لەیلی بە ئیبنی سیرینی گوت: «دەبینی ئەم ئەبوو حەنیفە -ئەم بێچووە جۆلایە- هەرچی فتوای لەسەر دەدەین، ڕەتی دەکاتەوە». گوتی: «نازانم بەچکە جۆلایە یا نە، بەڵام دەزانم دونیا ڕووی تێناوەو ئەم پشتی تێدەکا، کەچی ئێمە ڕوومان لە دونیا ناوەو دونیا لە بەرمان هەڵدێ». ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «قەد پێم وا نەبوو لە نێوانماندا کەسێک هەیە کە حەزی لە دونیایە، تا ئەم ئایەتە هاتەخوارێ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْأَخِرَةَ[1] هەروەها ئەم ئایەتە کە دەڵێ: وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ ٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ أَوِ ٱخْرُجُوا۟ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ[2]. کە موسوڵمانان گوتیان گەر بمانزانیبا حەزی خودا لە چییە، گشتمان دەمانکرد، ئەم ئایەتە ئەو دەمە هاتە خوارێ».

فرۆتنی سەهۆڵ بە زێڕ سەرمایەی زۆری ناوێ، هەرچەند هۆزان و بلیمەتان چادەزانن کە ڕێژەی دونیا بۆ دواڕۆژ لەوەش کەمترە، بەڵام ئەمە لە خەڵکی بەرپیوارە، بە سێ بۆنەوە: **یەک**، سستی بڕوا، **دوو**، زاڵبوونی ئارەزووی نەفس و **سێ** درەنگکردن و خستنە دواوەو بە ڕۆژی دی ئەسپاردن. هۆی سەرەکی، زاڵ بوونی شاوەتە و دەروستی نەهاتنە لەو کاتەدا، نەختڕاگرتن و قەرز لە بیر کردنە.

## هێژایی پارێزکاری

هەرچیمان لە لۆمەی دۆستی دونیا گوت بەم بۆنەوە بوو، دۆستایەتی دونیا ژاری کوشندەیە و دوژمنایەتی دونیا نەجاتدەرە.

---

١ ـ (قورئان، ١٥٢/٣) ئێ وا هەبوو حەزی لە ماڵی دونیا بوو، ئێ واش هەبوون دواڕۆژیان دەویست. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ٦٦/٤) ئەگەر ئێمە بۆ ئەمانەمان نووسیبا کوشتاری خۆ بە خۆ بکەن، یان لە وڵاتوو دەرکەون -کەمیان نەبێ- نەیاندەکرد. (هـ)

لێرەدا ئەو خەبەرانەی لە مەڕ دوژمنایەتی دونیا هاتوون، دەڵێینەوە. باشترین بەهرەی پارێزکاری ئەوەیە کە لە قورئاندا دراوەتە پاڵ زانایانەوە. کاتێ قاروون لە نێو کەژاوەی بەزێڕ خەملاوەکەیدا لە نێو کۆشک و تەلاری هاتەدەر، خەلک دەیانگوت بریا ئەوە ئێمە بایاتین: وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ[1] زانایان گوتیان پاداشی دوارۆژ لەمە گەلێک هێژاترە. بەم بۆنەوە گوتوویانە هەرکەس چل رۆژ خۆی لە دونیا ببوێری و پارێز بکا، کانیاوی هۆزانی لە دلیدا سەرهەڵدەدا. پێغەمبەر فەرمووی: «گەر پێت خۆشە پەروەردگار خۆشی بوێی، لە دونیا پارێز بکە». کاتێ حارسە بە پێغەمبەری گوت: «من بە راستی بڕوادارم». فەرمووی: «نیشانەکەی چییە؟» گوتی: «نەفسم وا لە دونیا سڵی کردووە کە زێڕ و بەرد لە لام وەک یەکن و دەڵێی سەیری بەهەشت و دۆژەدەکەم». فەرمووی: «جوان رایگرە، ئەو شتەی کە دەبێ ببینیتەوە، بینیوتەوە». پاشان گوتی: «ئەمە بەندەیەکە کە پەروەردگار دڵی ڕووناک کردۆتەوە: عَبدٌ نورَ اللهُ قَلبَهُ». کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ[2] گوتیان: «پێغەمبەری خودا! شرۆڤە ئەمە چییە؟» گوتی: «ئەوەیە کە دڵی لەم خانووە خاپینۆکە بڕەوێتەوەو روو لە خانووی هەتا هەتایی بنێ و بەر لە مردن، توێشووی مردنی تەیارکا». پێغەمبەر فەرمووی: «لە پەروەردگاری مەزن شەرم کەن، بەو جۆرەی کە شیاوە لە خودا شەرم بکرێ». گوتیان: «شەرم ناکەین؟» فەرمووی: «دەیسا بۆچی سامانێ کۆوە دەکەن، کە پێتان ناخورێ و خانوویەک بنیات دەنن کە تێیدا ناژین؟»

رۆژێک پێغەمبەر خوتبەی دەخوێند، گوتی: «هەرکەس بەڕاستی بڕوای بە لا الهَ الاّ الله بێ و شتی-تری تێکەڵ نەکا، بەهەشت جێگایە». عەلی هەستاو گوتی: «یا پێغەمبەر! بۆمان راڤەی کە بزانین ئەوە چییە کە نابێ تێکەڵی بکرێ». فەرمووی: «دۆستی و گەڕان بە دووی دونیا، چونکە تاقمێ هەن پەیڤیان، پەیڤی پێغەمبەرانە و ئاکاریان هی ستەمکارانە؛ هەرکەس لا الهَ الاّ اللهی هێنا و خۆشەویستی دونیای لە دڵدا نەبوو، بەهەشت جێگایە». پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس لە دونیا خۆی بپارێزێ، پەروەردگار دەرگای هۆزانی و بەردەباری بەسەر دڵیدا دەکاتەوەو لەسەر زاری رەوانی دەکاو دەرد و دەرمانی دونیای پێ پیشان دەداو لەم جیهانەوە بە سەلامەت بەرەو ئەو جیهانی دەبا».

جارێک پێغەمبەر لەگەڵ یارانی لە چۆلێکدا رادەبردن. لە رێدا چاویان بە گەلە حوشترێ کەوت؛ حوشتر بە نرخترین گیاندارە لە لای عارەب و و چۆڵنشین؛ چونکە هەم شیر و گۆشت و پەشمی لێ

---

[1] ـ (قورئان، ۲۸/۸۰) هۆزانەکانیش دەیانگوت: هەی ماڵ وێران! هەر کەسێ باوەری بەخودا هەبێت. (هـ)

[2] ـ قورئان، ۱۲۵/٦.

دەگرن، هەمیش سواری دەبن و باری پێ رادەگوێزن. پێغەمبەر رووی وەرگەڕاند و سەیری نەکرد. گوتیان: «ئەی پێغەمبەری خودا! حوشتر بە نرخترین دارایی عارەبە، بۆچی سەیری ناکەی؟» فەرمووی: «پەروەردگار گوتوویە پێم کە سەیریان نەکەم. گوتوویە: وَلَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ زَهۡرَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ [1]ٱلدُّنۡيَا».

بە عیسایان گوت: «ئیزن بدە با خانوویەکت بۆ ساز بکەین کە عێبادەتی تێدا بکەی». گوتی: «برۆن و لەسەر ئاو بینای کەن». گوتیان: «لەسەر ئاو چۆن دەبێ؟» گوتی: «بە دۆستی دونیاوە چۆن عیبادەت دەکرێ؟» پێغەمبەری خۆمان گوتی: «گەر دەتەوێ خودا خۆشتی بوێ، واز لە دونیا بهێنە؛ گەریش دەتەوێ خەڵک خۆشتیان بوێ، چش کە لەو شتەی ئەوان خۆشیان دەوێ». حەفسە بە بابی خۆی گۆت: «بابەگیان! کە ئەم جار دەسکەوتەکان لە شارەکانەوە هێنایەوە، بەرگێک نەرمتر لەمە و خۆراکێک خۆشتر لەمە بۆ خۆت دابنێ، تا بەڵکوو ئەوەش کە لە گەڵتە لێی بخوا». گوتی: «حەفسە گیان! کەس وەکوو ژن لە بارودۆخی مێردەکەی نازانێ، تۆ باشتر لە هەمووان حاڵی پێغەمبەر دەزانی. سوێند بە خودا! ئەو چەن ساڵەی کە محەممەد پێغەمبەر بوو، خۆی و بنەماڵەی کە بەیانی تێریان بخواردایە، شەو بە سکی برسی دەنووستن، کە شەو تێر بایەن، بەیانییەکەی برسی بوون؛ سوێند بە خودا لە چەن ساڵی پێغەمبەریدا پڕ سکی خۆی خورمای نەخوارد تا ئەوەی شاری خەیبەر گیرا. سوێند بە خودا خۆت دەزانی جارێک خواردنیان نابووە نێو خوان بۆی، لەبەر کرێتی ئەم کارە رەنگی رووی وەرگەڕا و فەرمووی تا لەسەر زەوەیدا دایاننا؛ سوێند بە خودا خۆت دەزانی کە شەوێ لە نێو نوێنێکی دووتوێدا دەنووست، شەوێک بۆیان کردە چوار توێ، بەیانی گوتی: "ئەو نوێنە کرابووە چوار توێ، بۆ نوێژی بەیانی بە خەبەر نەبووم. بۆمی بکەنەوە بە دوو توێ"؛ سوێند بە خودا کە خۆت دەزانی، کاتێ کراسەکەیان شۆرد، بەلال بانگی دەگوت، تا جلکەکەی وشک نەبووەوە نەیتوانی لە ماڵ بێتە دەر، چۆن بەرگێکیتری نەبوو؛ سوێند بە خودا کە خۆت دەزانی ئافرەتێکی لە هۆزی بەنی زەفەر سەروێنێک و فۆتەیەکی بۆ دووراند، یەکێکیانی زووتر بۆ نارد، کە هاتە دەرەوە بەستبووی بە دەوری خۆیدا، چونکە بێجگە لەوە چیتری نەبوو». حەفسە گوتی: «هەمووی دەزانم». هەردووکیان ئەوەندە گریان، کە بوورانەوە. پاشان گوتی: «دوو یاری من پێشتر رۆیشتن -واتە محەممەد و ئەبووبەکر- ئەوان رێگایەکیان بڕی کە گەر منیش لە وێدا بڕۆم، پێیان دەگەم، ئەگینا لە شوێنێکی دی سەر دەردێنم. من لەسەر ئەو ژینە ئەستەمە دەمێنمەوەو پشوودرێژی دەکەم، تا بەیانی پێکرا ژینێکی خۆشمان بوێ».

---

١ ـ قورئان (٢٠/١٣١) چاوت مەدە سەر ئەو شتەی کە داومانە بە دەستەگەلێ لەوانە؛ کە ئەمە هەر خۆشی ژیانی دنیایەو هەر ویستوومانە بیانئەزموویین. (هـ).

هەندێ لە یارانی پێغەمبەر بە هەندێ لە تابعینیان گوت: عیبادەتی ئەنگۆ فرەتر لە عیبادەتی سەحابەیە، بەلام ئەوان چاکتر لە ئێوەن؛ چونکە لە دونیا پارێزکارتر لە ئێوە بوون. عومەر گوتی: «خۆپارێزی لە دونیا هەم دەبێتە هۆی ئاسوودەگی لەش و هەمیش ئارخەیانی دڵ».

ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «دوو رەکات نوێژی پارێزکار لە دونیا، هێژاترە لە هەموو عیبادەتی موجتەهیدان تا کۆتایی تەمەنیان».

سەهلی توستەری دەڵێ: «کاتێ دەتوانی بێخەوشانە کارێک بکەی کە لە چوار شت نەترسی: برسێتی، رووتی، نەداری و زەبوونی».

## شرۆڤەی ئاستەکانی پارێزکاری

بزانە پارێزکار سێ ئاستی هەیە:

**یەکەم:** ئەوەیە کە واز لە دونیا دێنێ، دڵی سەیری دەکا، بەلام بە کۆشتەوە خۆی لێ دەبوێرێ. ئەم خۆ بە پارێزکار کردنە، نەک پارێزکار بوون، ئەمە سەرەتای رێی پارێزگارییە.

**دووەم:** ئەوەیە کە دڵی سەیری دونیا ناکات، بەلام سەیری پارێزکاری خۆی دەکاو بە شتێکی دەزانێ. ئەمە پارێزکارە، هەرچەند لە کەمایەسی خاڵی نییە.

**سێیەم:** ئەوەیە کە لەمەر پارێزکارییەکەی خۆیشی پارێزکار بێ و بە شتێکی گرینگی نەزانێ. ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە بڕیارە ببێتە وەزیری پادشایەک. کە دەگاتە بەر دەرکی کۆشک، سەگێک دەرپاچەی دەگرێ، کابرا بۆ ئەوە سەگەکە وازی لێ بێنێ، لەتە گۆشتێکی بۆ دەهاوێژێ، پاش ئەوەی لێی رزگاری بوو، دەڕواتە لای پادشاو لەسەر تەختی وەزیری رۆدەنیشێ.

بۆ گەیشتن بەو پاگەیە، ئەو پاروە هیچ بایەخێکی نییە کە باسی لێوە بکاو ناوی ببا. دونیا پاروویکەو شەیتانیش سەگی بەر دەرگای پادشای هەژدەهەزار عالەمە. کە دونیات پێدا، وازت لێ دێنێ و لە کۆڵت دەبێتەوە. دونیا لە هەمبەر دواڕۆژ زۆر کەمترە لە پاروویەک لە بەرانبەر گەیشتن بە پلەی وەزیری، چونکە دواڕۆژ دوایی بۆ نییە و هەتا هەتایە.

### پارێزکاری لە ئاست ئەو شتەی پارێزی لێ دەکرێ، سێ شتە:

**یەکەم** ئەوەیە کە لە دونیا پارێز بکا تا لە سزای دواڕۆژ رزگاری بێ و بەس؛ گەر بەرەو نەمانی بەرن بەڕەوای دەزانێ. ئەمە پارێزکاری خوداترسانە. جارێک مالکی دینار گوتی: «دۆیشەو وێرام لە پەروەردگارم داوای بەهەشتم کرد».

**دووەم** ئەوەیە کە بۆ پاداشی رۆژی پەسلان لە دونیا پارێز بکا؛ ئەمە تەواوترە، چونکە پارێزکاریەکەی

لەبەر هیوا و خۆشەویستیە. ئەمە پارێزکاری هیوادارانە.

**سێیەم** ئەوەیە کە نە لە دۆژەەبترسێ و نە ئاور لە بەهەشت بداتەوە، بەڵکوو تەنیا لەبەر خۆشەویستی پەروەردگار لە دونیا پارێز دەکاو خۆشەویستی پەروەردگار دونیای لەبەرچاو سووک و چرووک کردووەو پێی شەرمە ئاوڕی لێ بداتەوە. هەر وەک رابیعە کە باسی بەهەشتیان بۆ کرد گوتی: «اَلجارُ ثمَّ الدَّارُ؛ واتە خودانی خانوو هێژاترە لە خودی خانوو». ئەوەی خۆشەویستی پەروەردگاری لە دڵ هاتبێتەدی، چێژی بەهەشتی لە دڵدا وەکوو یاریکردنی منداڵان بە چۆلەکەی لێ دێ لە ئاستی بوون بە پادشا. رەنگە ئەو منداڵە یاری بە چۆلەکەی پێ خۆشتر بێ تا پادشایی، چونکە مژی باش نەمەیوە و لە چێژی پادشایی هیچ نەگەیوە. هەرکەس بێجگە لە دیداری پەروەردگار دۆزێکیتر رەچاو بکا، ئەوە هێشتا کرچ و کاڵە و باش نەگەیوە و نەبۆتە پیاو.

هەروەها ئاستەکانی پارێزکاری بە گوێرەی ئەو شتەی پارێزی لێ دەکرێ، جیاوازە. برێ کەس هەیە کە تەنیا لە هەندێ شتی دونیا پارێز دەکا؛ بەڵام تەواوتری ئەوەیە کە هەرچی نەفس حەزی پێ دەکاو کەڵکێکی بۆ دوارۆژ نییە، چشی لێ بکا؛ چونکە دونیا بریتیە لە چێژی نەفس لە ماڵوسامان و پلە و پاگە و خواردن و پۆشین و گوتن و خەوتن و هەڵس و کەوت دەگەڵ خەڵک و دەرس و دەورکردن و گێڕانەوەی حەدیس؛ هەر چیش بۆ کەیفی نەفس بێ، هەمووی هی دونیایە مەگین مەبەست لەو چێژە گەیشتن بە پەروەردگار بێ.

ئەبووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «لەمەڕ پارێزکاری قسەی زۆرم بیستووە، بەڵام پارێزکاری لە لای ئێمە ئەوەیە کە هەرچی لە خودات خافڵ دەکا، دووری لێ بگرە». گوتی: «هەرکەس خەریکی ژن مارەبڕین و سەفەر و حەدیس نووسین بوو، پەرژاوەتە سەر دونیا». لێیان پرسی: «إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ[1] واتای چییە؟» گوتی: «دڵی پاکژ دڵێکە کە بێجگە لە خودا چیتری تێدا نەبێ».

«یەحیای کوڕی زەکەریا، بەرگی پەڵاسی دەبەردەکرد، تا نەرمی جلوبەگ، لەشی نەلاوێنێ، چونکە ئەوەش لە چێژەکانی نەفسە». دایکی تکای لێکرد کە بەرگێکی پەشم دەبەرکا با کەمتر لەشی بە هۆی ئەو پەڵاسەوە ئازار ببینێ. وەحی بۆ هات کە ئەی یەحیا بە جێی من دونیات هەڵبژارد! دایە پرمەی گریان و پەڵاسەکەی کردەوە بەر. بزانە، ئەمە ترۆپکی پارێزکارییە و رەنگە کەس نەگاتە ئەم ئاستە، بەڵام رادەی هەرکەس ئەوەیە کە دووری لێ گرتووە. هەروەک چۆن تەوبە لە هەندێ گوناح دروستە، پارێزکاری لە برێ شتی دونیاش هەر دروستە، واتە بێکەڵک و بێپاداش نییە؛ بەڵام ئەو مەقامەی کە لە دوارۆژدا بۆ پاشگەز بوو لە گوناح و پارێزکار رەچاو کراوە، بۆ ئەوانەیە کە بە تەواوی

---

١ ـ (قورئان، ٨٩/٢٦) مەگین ئەوەی وە دڵی پاک بچێتە بارەگای خودا. (هـ)

وازیان هێنابێ.

## شرۆڤەی ئەو شتانەی کە پارێزکار دەبێ لە دونیادا قنیاتیان پێ بکا

مرۆڤ کەوتۆتە نێو ئاوری بە نێڵە نێلی دونیاوە؛ ساراکانی دونیا بێ برانەوەن بەلام گرینگ لە دونیادا شەش شتە: خواردن، پۆشەن، خانوو، کەل‌وپەلی ماڵ، ژن، ماڵ‌وسامان.

**گرینگی یەکەم خواردنە** و باس لەسەر چەند و چوون و جۆری پێخۆرە.

بەلام **جۆری** ئەوەیە کە کەمترین شتێ کە بە خۆراک ناوی ببرێ، هەرچەن تەنیا سوە بێ، ناوەندی نانی جۆ و دانەوێلەیە؛ خوارترینی بریتیە لە نانی گەنمی نەپێژراوە، گەر پێژرا، لە پارێزکاری دێتەدەرو دەبێتە رابواردن.

**رادە:** کەمترینی دە سیرە؛ ناونجییەکەی نیومەنە و زۆرترینی مووددێکە. شەرع بۆ هەژار ئەمەی رەچاو کردووە و گەر پتر لەمە بخوا، پاراستنی گەدەی لە خواردن فەوتاندووە.

پاشەناز بۆ داهاتوو: گەورەترین و سەرترین ئاستی ئەوەیە کە پتر لە تێرکردنی ئەو ژەمەنە، چیدی هەڵنەگرێ؛ چونکە پارێزکاری بەمانای کورت کردنەوەی ئاواتەکانە؛ ناونجییەکەی ئەوەیە کە خواردنی مانگێک یان چل رۆژ هەلبگرێ؛ کەمترینی ئەوەیە کە بە قەدەر ساڵێ پاشەناز کا. زۆرتر لەمە بە پارێزکاری نایەتە هەژمار؛ چونکە هەرکەس هیواداره کە پتر لە یەک ساڵ بژی، ئەوە پارێزکاری پێ نابێژرێ. پێغەمبەر بووە کە خواردنی یەک ساڵی بۆ بنەماڵەکەی داناوە، چونکە توانی پشوودرێژییان نەبووە؛ بەلام بۆ خۆی تا شەویش هیچی نەهێشتووە.

بەلام **پێخۆر:** کەمترینی سرکەو کەورگە؛ ناونجیەکەی رۆن و ئەو شتەی لە رۆنی چێ دەکەن و زۆرترینی گۆشتە، گەر بەردەوام گۆشت بخوا، لە پارێزکاری لای داوە، هەروەها گەر حەوتەیەک پتر لە یەک یان دوو جار گۆشت نەخوا، بە تەواوی لە پارێزکاری لای نەداوە.

**کاتی خواردن:** دەبێ رۆژی زۆرتر لە جارێک نەخوا، گەر دوو رۆژ جارێک بخوا، تەواوترە. بەلام رۆژێ دووجار بە پارێزکاری نایەتە ئەژمار.

هەرکەس دەیەوێ بزانێ پارێزکاری چۆنە، دەبێ لە ژینی پێغەمبەر و یارانیدا ورد بێتەوە. عایشە دەڵێ: «کاتی وا بوو کە چل‌رۆژ هیچ متبەقێ لە ماڵی پێغەمبەردا پێنەدەکرا و تەنیا خواردنمان خورما و ئاو بوو». عیسا گوتی: «هەرکەس تامازرۆی بەهەشتە زۆرتر خواردنی نانی جۆ و خەوتن لەسەر سەنێرگا لەگەڵ سەگانە». هەروەها گوتی: «ئەی حەوارییەکان! نانی جۆیین بخۆن و ئاوڕ لە نانی گەنم مەدەنەوە، چونکە شوکرانەبژێری نانی گەنمتان پێ ناکرێ».

**گرینگی دووەم جلکە:** پارێزکار دەبێ پتر لە بەرگێکی نەبێ، کاتێ شۆردی، بێ بەرگ بمێنێتەوە؛ کە بوو بە دووان ئیدی پارێزکار نییە.

کەمترین جلک ئەوەیە کە کڵاوێک و کراسێک و پێڵاوێ بێ؛ زۆرترینیشی ئەوەیە کە لەگەڵ ئەمانە سەروێن و پووزەوانەیەکیشی بێ.

جۆری پۆشەن: کەمترینی پەڵاسەو ناونجییەکەی پەشمی زبرە و زۆرترینی لۆکەی زبرە. کە نەرمتر و ناسکتر لەمە بوو، لە پارێزکاری لای داوە. کاتێ پێغەمبەر ئەمری خودای بەجێهێنا و بەرەو لای بینایی چاوان کۆچی کرد، عایشە بەڕێک و عابایەکی ئەستووری هێناو گوتی: ئەمە پۆشەنی بووە و بەس.

لە خەبەردا هاتووە کە «کەس نییە کە جلکێکی ئارەزوولێکراو بکاتە بەر و خودا رووی لێ وەرنەگێڕێ؛ هەرچەن دۆستی خوداش بێ. تا ئەوەی کە لەبەری دایکەنێ». نرخی دوو بەرگی پێغەمبەر -عاباو بەرەکەی- فرەتر لە پازدە درهەم نەبوو. کاتی وا بوو ئەوەند جلکەکەی پیس دەبوو، دەتگوت جلکی دۆشاوگرە. جارێک بەرگێکیان بۆ هێنا کە نەخش و نیگاری بە سەردا بوو، کردییە بەرو خێرا لە بەری دایکەندو گوتی: «بیبەن بۆ بووجەهم و بەرەکەی ئەوم بۆ بێنن، ئەم نەخش و نیگارە چاوی پەرژاندمە سەر خۆ». لەسەر مینبەردا کلکەوانەکەی لە قامکی دەرهێنا، چونکە جارێک سەرنجی ڕاکێشایە لای خۆ و گوتی: «سەرنجێک بۆ ئەمە و یەکێک بۆ ئێوە». جارێک پێڵاوێکی بەدەمویان بۆ هێنا، کڕنوشی لەبەر پەروەردگار برد و هێنایە دەرو یەکەم هەژارێکی کە دی، پێیدا و گوتی: «لەبەر چاوم زۆر جوان بوو، ترسام پەروەردگار لەم سۆنگەوە بە دوژمنم بزانێ، بۆیە کڕنۆشم بۆ برد». عایشە گوتی: «پێغەمبەر فەرمووی: "گەر دەتەوێ لەو دونیاش دەگەڵم بی، لەم دونیا بە قەدەر توێشووی مسافرێ هەڵبگرە و هیچ بەرگێکت دەبەر دامەکەنە تا تەواو پەرپووت و دڕاو نەبووبێ"».

کراسەکەی عومەر چواردە پینەی پێوە بوو. عەلی لە سەردەمی خەلافەتیدا جلکێکی کڕی بە سێ درهەم، لە قۆڵەکەی هەرچی لە دەستی درێژتر بوو، دڕاندی و گوتی: «سپاس بۆ خودا کە ئەمە خەڵاتی ئەوە». یەکێک گوتوویە: «ئەو جلک و پێڵاوەی کەسەفیانی سەوری دەبەری کردبوو، نرخاندم، زۆرتر لە چوار درهەمونیو نرخی نەبوو». لە خەبەردایە کە: «هەرکەس بتوانێ جلکی گران و رازاوە بکڕێ و لەبەر خودا نەیکڕێ، لەسەر پەروەردگار پێویستە کە لە بەرانبەر ئەو کارەیدا قوماشی ئاوریشمین و تەختی یاقووتی لە هەمبەردا پێ بدا». عەلی گوتی: «پەرەردگار پەیمانی بەستووە لەگەڵ پێشەوایانی ديندا کە بەرگەکانیان کەم نرخترین بەرگی خەڵکی بێ، تاکوو دەوڵەمەندان چاویان لێ کەن و بکەونە دوویان، با هەژاران خەمی پێ نەخۆن».

فەزاله کوڕی عەبید، پادشای میسر بوو، چاویان پێکەوت که به پێخواس دەڕوا و جلکێکی سوور و کەمی له بەردایه. گوتیان: «تۆ سەرۆکی شاری، وا مەکه». گوتی: «پێغەمبەر له رابواردن بەرگری کردووین و گوتووی جاربەجار به پێخواس بڕۆین بەرێدا». محەممەدی کوڕی واسیع به کەڵپۆسەوە رۆیشته لای قەتیبەی کوڕی موسلیم، گوتی: ئەمەت بۆ کردۆته بەر؟ بێدەنگ بوو. گوتی: «بۆچی وڵامم نادەیتەوە؟» گوتی: «نامەوێ بڵێم به بۆنەی پارێزکاریوە، چونکه پەسنی خۆم کردووەو نامەوێ بڵێم له نەداریوە، چونکه گله و گازندەم له خودا کردووە». به سلەیمانیان گوت: «بۆچی جلکی بەدەو ناکەیته بەر؟» گوتی: «بەنده چ کاری هەیه به جلکی جوانەوە. سبەی گەر دەرباز بم، بۆ جلکی جوان دانامێنم». عومەری عەبدولعەزیز شەوان بۆ شەونوێژ پەلاسی دەکرده بەر و به رۆژ دایدەکەند با خەڵک نەیبینن. حەسەنی بەسری به فرقەدی سەبخی گۆت: «پێت وایه چونکه پەلاست کردۆته بەر له خەڵک سەرتری؟ ژنەفتم زۆربەی خەڵکی دۆژەهپەلاس لەبەرانن».

**گرینگی سێیەم خانووە.** کەمترینی ئەوەیه که هیچ جێگایەکی نەبێ و له سووچی مزگەفت یان خانەگایەک سەربنێتەوە؛ زۆرتر لەوە ئەوەیه که هۆدەیەکی بێ به کرێ یان بەکرین، به قەدەر نیازی خۆی، نابێ بڵیند بێ و نەخش و نیگاری له سەردا بێ. گەر سرمیچەکەی بەرزتر له شەش گەز و دیوارەکانی سواخی گەچ بێ، له پارێزکاری کلابووە. به کورتی مەبەست له خانوو ئەوەیه که لەبەر باو باران و بەفر و بۆران خۆ بپارێزێ، نه شتێکیتر.

دەڵێن یەکەم شتێک که پاش پێغەمبەر داهات، خانوو کردنەوە به گەچ بوو و درزی جلک دروونەوە، چونکه لەو سەردەمەدا هەر جلکێک تەنیا درزێکی بوو. دەڵێن عەبباس دەرگایەگی بەرزی داکردبوو، پێغەمبەر فەرمووی تێکی بدە. رۆژێک له شوێنێک رادەبورد خانوویەکی زۆر گەورەی دی، فەرمووی ئەمه هی کێیه؟ گوتیان فلانکەس. پاش ئەو رۆژە که ئەو کەسه دەهاته لای پێغەمبەر، پێغەمبەری سەیری نەدەکرد و رووی لێ دەگێڕاوە. تا ئەو کەسه هۆکەی پرسی، پیێ گوت. کابرا رۆیشت و خانووەکەی تێکدا. پاش ئەوە پێغەمبەر لێی خۆش بوو و دوعای خێری بۆ کرد. حەسەن دەڵێ: «پێغەمبەر له هەموو تەمەنیدا خشتی لەسەر خشت و بەردێکی لەسەر بەرد دانەنا».

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس پەروەردگار تووشیاری شەڕی کا، ماڵی له ئاوو قوڕدا به خەساردەدا». دیسان پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس پتر له نیازی ماڵ کاتەوە، رۆژی پەسلان دەڵێن دەبێ تێکی بداو کۆی کاتەوە». هەروەها گوتی: «له هەموو کارێکدا مز هەیه، بێجگه ئەو کارەی له ئاو و خاکدا بێ». نووح له قامیش خانوویەکی چێ دەکرد؛ گوتیان: «گەر له خشت و چێوی بکەیتەوە چییه؟» گوتی: «ئەو کەسەی که هەر دەبێ بمرێ، ئەمەی بۆ بەسته». پێغەمبەر

فەرمووی: «هەر بینایەک کە بەندە چێی دەکا، ڕۆژی پەسلان دەبێتە بارێکی گران بەسەر ملیەوە، مەگین ئەوەی بۆ پاراستن لە سەرما و گەرما چێ کرابێ». عومەر لە ڕێی شامدا کۆشکێکی بینی کە لە خشت چێ کرابوو، گوتی: «قەد پێم وا نەبوو کە ئەم ئۆممەتە ئەوەی هامان بۆ فیرعەونی کردەوە، بکەنەوە»؛ چونکە خشتی پێژراو فیرعەون لە هامانی ویست، گوتی: «اَوقد یا هامانُ عَلی الطّین».

لە ئاساردا هاتووە کە: «کە بەندە بینایەکی بنیات نا کە لە شەش گەز بلیندتر بوو، فریشتەیەک هاوار دەکاو دەڵێ: هۆ خراپکارترینی خراپکاران! بۆ کوێ دێ؟» واتە: تۆ دەبێ لە زەویدا ڕۆبچی و لە قەبردا، بۆچی بەرەو ئاسمان دێ؟

حەسەنیبەسری دەڵێ: «لە ماڵی پێغەمبەردا دەست بە سرمیچ دەگەیشت». فوزەیل دەڵێ: «ئەوەم پێ سەیر نییە کە ماڵ دەکاتەوەو بە جێی دێڵێ، ئەوەم پێ سەیرە کە دەبینێ و پەند ناگرێ».

**گرینگی چوارم کەل و پەلی ماڵە**. بەرزترین ئاستی، ئاستی عیسایە کە هیچی نەبوو، بێجگە شانە و گۆزەیەک. کابرایەکی دی کە بە دەست ردێنی شانەدەکا، شانەکەی فڕێدا، یەکێکتری دی کە بە دەست ئاو دەخواتەوە، سەوەکەی وەلانا. کەمترین ئاستی ئەوەیە کە لە هەر شتێک کە بۆژین گرینگ بێ، یەکێکی هەیە، یا لە قوڕ یان لە دار. گەر برنجە و کانزایتر بێ، پارێزکاری نییە.

پێشوونان هانیان داوە کە شتێک بۆ چەن کار بە کار بێنن.

بالیفی پێغەمبەر لە چەرم بوو و ناوەکەی لیفی خورما بوو، ژێرەخەری پەڕێکی دووتوێ بوو. ڕۆژێک عومەر چاوی پێکەوت بینی کە شۆپی حەسیر بە لاپالیدا دەرهاتووە، گریا. پێغەمبەر فەرمووی: «عومەر بۆ چ دەگری؟» گوتی: «قەیسەر و کەسرا کە نەیارانی خودان، لەو خۆشیەدا دەژین، تۆ کە ناردراو و دۆستی خودای، بەم دژوارییە دەژی». گوتی: «ئەی عومەر! شادومان نی بەوەی کە ئەوان لە دونیا بەشیان دەدرێ و ئێمە لە دوارۆژ؟» گوتی: «هەم». گوتی: «دڵنیا بە کە هەروایە».

یەکێک ڕۆیشتە نێو ماڵی ئەبووزەر، ماڵەکەی هیچی تێدا نەبوو، گوتی: «لەم خانووەتدا هیچ شت نییە؟» گوتی: «ئێمە خانوویەکمان هەیە، هەرچیمان دەسکەوێ بۆ ئەوێی دەنێرین»؛ واتە: ئەو جیهان. گوتی: «تا لێرەی ناچار دەبێ ناو ماڵێکت بێ». گوتی: «خودانی ئەم ماڵە لێرەمان ناهێڵێ».

کاتێ عەمیر کوڕی سەعد -کە سەرۆکی حەمس بوو- گەیشتە لای عومەر، گوتی: «لەم دونیا چیت هەیە؟» گوتی: «گۆچانێ کە پاڵی پێوە دەدەم و ماری پێ دەکوژم، هەمانەیەک کە خۆراکی تێ دەخەم و دەفرێ کە خۆراکی تێدا دەخۆم و سەر و بەرگیشمی تێدا دەشۆم، ئافتاوەیەک کە دەسنوێژی پێ دەشۆم. لە دونیادا هەرچی هەیە بێجگە لەمە، هۆی کەوتنە دووی دونیایە».

پێغەمبەر لە سەفەر گەڕایەوە و ڕۆیشتە ماڵی فاتیمە. بینی کە پەردەیەکی هەڵداوە و دو بازنەی زیوینی لە دەستدایە. نەڕۆیشتە ژوور و لەبەر کرێتی ئەوانە گەڕایەوە. کاتێ فاتمە تێگەیشت بابی بۆچی نەهاتۆتە ژوورێ، بازنەکانی فرۆتە درهەمونیوێک و پەردەکەشی دا بە هەژارێ؛ پێغەمبەر لێی دڵخۆش بوو و فەرمووی: کاری چاکت کرد. لە ماڵی عایشەدا پەردەیەک هەڵواسرا بوو. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرگا ئەم پەردەیە دەبینم، دونیام دێتەوە بیر، ببەن و بیدەن بە فلان‌کەس». عایشە دەڵێ: «پێغەمبەر شەوان لەسەر بەڕێکی دوو توێ دەنووست، جارێک رایەخێکی نوێم بۆ راخست، ئەو شەوە پێچی لە خۆ دەداو خەوی لێ نەکەوت. بەیانی گوتی: "دوێشەو خەوم لێنەکەوت، رایەخەکەی خۆم بێننەوە"». جارێکش زێڕیان بۆ هێنابوو، هەمووی دابەش کرد، شەو شەش دیناری لە لاما بۆوە، ئەو شەوە خەوی لێ برا، تا شەو دوایی هات ئەوەشی خێرا بەشییەوەو بەهێمنی خەوی لێکەوت. بەیانی گوتی: «گەر ئەمشەو بمردایەم و ئەم شەش دینارەم لە کن بایە، چ حاڵێکم دەبوو».

حەسەنی بەسری دەڵێ: «حەفتا کەس لە یارانی پێغەمبەرم دیەوە کە کەسیان بێجگە لە بەرگێک کە دەیانکردەبەر، جلکی‌تریان نەبوو. چجار لە نێوان خۆیان و خاکدا پەردەیەکیان نەبوو، لەسەر خاک رادەکشان و بەرگەکەیان بەسەر خۆدا دەدا».

**گرینگی پێنجم نیکاحە:** سەهلی توستەری و سەفیانی عویەنەو تاقمێ‌تر گوتوویانە کە لە ژن هێناندا پارێزکاری نییە؛ چونکە پارێزکارترین کەس پێغەمبەری خودا بوو و پێغەمبەر ژنانی خۆش دەویست و خۆی نۆژ نی بوو، عەلی بەو هەمووە پارێزکارییەوەکە بووی، چوار ژن و دە دوازدە کەنیزی هەبوو. دەبێ بزانی کە بەمە ویستوویانە بڵێن کەس نابێ لە ژن هێنان خۆی ببوێرێ و لە خۆشی و چێژی پێوەندی دەگەڵ ژنان خۆی بێوەر کا بە بۆنەی پارێزکاریوە؛ چونکە ژن‌هێنان بۆ هاتنە دونیای منداڵە و منداڵیش قازانجی زۆرە و بەردەوامی بەرەی مرۆڤ بەوەوە بەستراوە. ئەمە وەکوو ئەوەیە کەسێک نان‌وئاو نەخوا تا هیچ چێژێ نەبا؛ بەم کارەی لە برسا دەمرێ و بەو کارەش بێ‌بەرە و تۆرەمە دەمێنێتەوە. بەڵام گەر ژن هێنان ببێتە هۆی ئەوەی کە لە خوا دوور کەوێتەوە، ژن نەهێنان چاترە. گەر کەسێک شاوەتی بە سەردا زاڵ بێ، پارێزکاری ئەوەیە کە ژنێک بێنی کە زۆر شۆخ نەبێ، چونکە دەبێ شاوەت‌دامرکێن بێ نەک شاوەت بزوێن. ئەحمەدی حەنبەل ژنێکی شۆخ و شەنگی دێنا، گوتیان ئەم ژنە خوشکێکی ژیر و بەفامی هەیە، بەڵام چاوێکی نییە. ئەوەیانی هێنا کە چاوێکی نەبوو.

جونەید دەڵێ: «پێم خۆشە شاگردی تازەکار دڵ لە سێ شت بپارێزێ: کار و ژن‌هێنان و نووسینەوەی حەدیس». هەروەها دەڵێ: «پێم خۆش نییە کە سۆفی بخوێنێ و بنووسێ، چونکە بیری دەشڵەژێنێ».

**گرینگی شەشەم ماڵ و پلەوپاگەیە.** لە بەشی کوشندەکاندا گوتمان کە ئەم دوانە ژاری کوشندەن، بەلام نەختێکی کە نیازی مرۆڤ پێک بێنێ، دەرمانە و لە دونیا نییە. بەڵکوو هەرچی نیازی دینە، لە دینە. خەلیل داوای قەرزی لە هەڤاڵێکی کرد، وەحی هات کە: «بۆچ لە دۆستی خۆتت نەخواست؟» گوتی: «پەروەرندەم! دەمزانی کە دونیا بە دوژمنی خۆت دەزانی، ترسام کە دونیات لێ داواکەم». فەرمووی: «هەرچی پێی نیاز بێ، لە دونیا نییە». بە کورتی گەر شاوەت و چنۆکییەکانی واز لێهێنا و لە ماڵوسامان ئەوەندە کە نیازی پێیە داوای کرد، دڵی لە دونیا دادەبڕێ و ئیدی خۆشی ناوێ. مەبەست ئەوەیە کاتێ بەرەو جیهانی هەرمانەوە پاشگەز دەبێتەوە، سەری شۆڕ و چاوی لە دوا نییە؛ کەسێک بەرەو دوا دەڕوانێتەوە کە دونیا ئارامگاو جێی حەسانەوەو پشوودانی بووبێ، بەلام بۆ ئەو وەکوو ئاودەستە کە تەنیا لە کاتی پێویستدا کەلکی لێ دەگرێ، کە مرد و کاری ئاو دەستی نەما، کەی ئاوڕی لێ دەداتەوە. بەلام ئەوەی دڵی بە دونیا ئەسپاردووە، وەکوو ئەو کەسەیە کە خۆی ببەستێ بە شتێکەوە کە بۆی نامێنێ، تەنانەت پرچی خۆی بەو شتەوە گرێ دابێ. کاتێ لێکتر دادەبڕن، چونکە پرچەکانی خۆی پێوە گرێداوە، گەلێک ئازار دەچێژێ تا یەک بە یەکی تاڵی پرچی دەپچڕێ و لێک دەبنەوە، پاشان هەر ژان و برینی برین و هەڵکێشانی پرچەکانی بۆ دەمێنێتەوە.

حەسەنی بەسری دەڵێ: «تاقمێکم بینی کە بە بەلا و زیان شادتر لەوە بوون کە ئێوە بە خێر و چاکە. گەر ئێوەیان بدیبا، دەیانگوت ئەمانە شەیتانەکانن، گەریش ئێوە ئەوانتان دەدی، دەتانگوت ئەمانە پەتیارەن. ئەم هۆزە بۆیە حەزیان بە بەلا دەکرد تا دڵیان لە دونیا کرمۆڵ بێ و لەبەر چاویان دزێو بێ و لە سەرەمەرگدا هیچ بەندیوارییەکیان پێوە نەمابێ».

## بنەمای پێنجەم - باس لە مەبەست و راستی و دلبێشی و بێخەوشی

بۆ دڵڕوونان، روون بۆتەوە کە خەڵک هەموویان فەوتاون، بێجگە پەرستندەکانی خودا. پەرستندەکان هەموویان فەوتاون بێجگە زانایان، زانایان هەموو فەوتاون بێجگە لەوانەی بە گوێرەی زانستیان دەجووڵێنەوە، ئەمانەش هەموو فەوتاون بێجگە لەوانەی بە دلبێشی و بێخەوشی عیبادەت دەکەن. بێخەوشان لەسەر مەترسییەکی زۆر گەورەن. کەواتە، بەبێ دلبێشی هەموو رەنجێ بە خەسار دەڕوا و بێخەوشی و راستیش تەنیا لە راستیدایە. ئەوەی مەبەست نەناسێ، چۆن دەتوانێ بێخەوشییەکەی بپارێزێ، بۆیە ئیمەش لە بەشێکدا راڤەی مەبەست دەکەین، لە بەشێکیتردا واتای دلبێشی ئاشکرا دەکەین و لە پاژی سێیەمدا راستەقینەی راستی دەخەینەروو.

### بەشی یەکەم - مەبەست

سەرەتا دەبێ شان و پلەی مەبەست بزانی، چونکە گیانی هەموو کارێک دۆزو مەبەستە و بە گوێرەی وی دەستوور دەدرێ و پەروەردگار سەرنج بە مەبەست دەدا. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەردگار سەیری بیچم و قەلافەتتان ناکا، سەیری دڵ و ئاکارتان دەکا». بۆیە بە دڵدا دەنوارێ، چونکە دڵ مەکۆی دۆز و مەبەستی وییە. پێغەمبەر گوتی: کارەکان بە پێی مەبەستن، هەرکەس لە عیبادەتەکانی ئەوەی بەردەکەوێ کە مەبەستیەتی، هەرکەس کۆچ بکا، واتە بازێری خۆی بە جێ بێلێ و بڕوا بۆ خەزا یان حەج -بۆ رەزای خودا- ئەو کۆچەی لە بۆ خودایە؛ هەرکەسیش بۆ ئەوەی بڕوا کە ماڵێک یا ئافرەتێ بە دەست بێنێ، ئەو کۆچەی بۆ خودا نییە و بۆ مەبەست و نییەتەکەیە. هەروەها گوتی: «زۆربەی شەهیدی ئوممەتی من لەسەر جێ و لە نێو نوێندا دەمرن، زۆریش لە نێو جەنگەی شەڕدا دەکوژرێن و خودا لە مەبەستی خەڵکی چاتر دەزانێ».

هەروەها فەرمووی: «مرۆڤ کاری چاکی زۆر دەکا و فریشتەکانی دەیبەنە خزمەت بینایی چاوان. خودا دەڵێ: "ئەمانەی لێ بسڕنەوە، چونکوو بۆ منی نەکردووە، بەلام فلان و فلان کاری بۆ بنووسن". دەڵێن: "خوایا! ئەم کارانەی نەکردووە". دەفەرمێ: "بەلام، مەبەستی بووە کە بیانکا"». هەروەها فەرمووی: «خەڵکی چوارن: یەکیان ماڵی هەیە و بە گوێرەی زانست خەرجی دەکا، یەکێکیتر

هیچی نییە، بەڵام دەڵێ گەر من بمبایە، وەکی ئەو کەسەم خەرج دەکرد. هەردووی ئەمانە لە پاداشدا بەرانبەرن، یەکێکی‌تر ماڵی هەیە و بە گوێرەی زانست خەرجی ناکا، یەکێکی‌تریان ماڵی نییە، بەڵام دەڵێ گەر منیش بمبایە، وەکوو ئەم کەسەم خەرج دەکرد. هەردووی ئەمانەش لە ئۆباڵ و گوناحدا وەکوو یەکن. واتە مەبەست بە تەنیا خۆی وەکوو ئەوەیە کارێک کرابێ».

ئەنەس دەڵێ: «جارێک پێغەمبەر لە شەڕی تەبووکدا لە خەزا هاتەدەر و گوتی: "خەڵکی زۆر هەیە لە مەدینەدا کە لەو ڕەنج و ئازار و برسێتی و تینوێتیەدا کە ئێمەی دەیچێژین، بەرانبەر و هاوشانن، بە بێ ئەوەی بەشداری خەزا بکەن". گوتمان: "چۆن؟ بۆچی دەگەڵمان نین؟" فەرمووی: "نەیانتوانیوە بێن، بەڵام نییەتیان وەکوو نییەتی ئێمەیە"».

لەنێو بەنی‌ئیسراییلدا کابرایەک بە تەپۆلکەیەکی مەزن لە زیخ گەیشت. سیاساڵ بوو، گوتی: «گەر ئەم کێوە گەنم بایە، لە نێو هەژاراندا دابەشم دەکرد». وەحی هاتە سەر پێغەمبەری سەردەم و گوتی: «بەو کابرایە بڵێ پەروەرندەت سەدەقەکەتی لێ قبووڵ کرد و ئەو پاداشەی کە گەر ئەو کێوە گەنم بایە و لە نێو هەژارندا دابەشت بکردایە، بەرت دەکەوت، پێتی داوە». پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس دۆزو مەبەستی و کۆشەوەی بۆ دونیا بێ، هەموو دەم هەژاری لەبەر چاوی خۆی دەبینێ و کاتێ بەرەو جیهانی هەرەمانەوە دەڕوا، گراوی دونیایە؛ ئەوەش مەبەست و کۆشەوەی دواڕۆژ بێ، پەروەردگار دڵی دەولەمەند دەکا و کە لە دونیا تێدەپەڕێ، خۆی لێ پاراستووە». هەروەها فەرمووی: «کاتێ موسوڵمانان لە بەرانبەر کافراندا ریزیان بەست، فریشتەکان نامەکانیان دەنووسن کە: فلان‌کەس لەبەر رقی خۆی شەڕ دەکا و فلان‌کەس لەبەر پیاوەتی شەڕ دەکا. مەڵێن فلان‌کەس لە ڕێی خوادا کوژرا؛ هەرکەس بۆ زاڵبوون و بەرزبوونەوەی تاکپەرستی خەباتی کرد، ئەوە لە ڕێی خودایە». هەروەها گوتی: «هەرکەس ژن دێنێ و مەبەستی ئەوەیە کە مارەیی نەدا، زیناکارە و هەرکەس قەرز دەکا و نیازی ئەوەیە کە نەیداتەوە، دزە».

زانایان گوتوویانە: سەرەتا مەبەستی کارت بزانە، پاشان کارەکەت فێر ببە. یەکێک گوتی: کارێکم پێ فێر کەن تا شەووڕۆژ خەریکی بم و هیچ چرکەیەک لە ژیانم بەبێ‌خێر نەبێ. گوتیان کە کاری خێرت پێ ناکرێ، بەردەوام مەبەستی چاکەت لە دڵدا بێ تا پاداشی ئەو چاکەیەت بەرکەوێ. بووهورەیرە گوتی: «خەڵک و خوا لە ڕۆژی پەسڵاندا بە گوێرەی نیاز و مەبەستەکانیان رادەبن». حەسەنی بەسری گوتی: «بەهەشتی جوان و بەدەوی هەتاهەتا، بەم چەن کارە کەڵوکوتەرەی ئەم دونیا نییە، بەڵکوو بە مەبەست و دۆزی جوانە کە کۆتایی بۆ نییە».

**ڕاستەقینەی مەبەست و دۆز:** مرۆڤ هیچ کارێکی لێ ناوەشێتەوە تا سێ نیازی بۆ نەیەتە دی:

زانست و ویست و دەسەلات. بۆ وێنە: تا خۆراکێک نەبینێ، نایخوا؛ کە بینی گەر نیازی پێ نەبێ و نەیەوێ، نایخوا؛ کە ویستی، بەلام دەستی کۆچ بوو و هیچی پێ نەدەکرا، دیسان نایخوا؛ چونکە دەسەلاتی نییە. کەواتە ئەم نیازە لە پێشی هەموو کارێکدایە.

بەلام کار، پاشەڕۆکی دەسەلاتە؛ دەسەلاتیش پاشکۆی ویست و خواستە، چونکە ویستن دەسەلات دەبزوێنێ؛ بەلام ویستن پێڕەوی زانست نییە، چونکە زۆر شت دەبینێ و نایەوێ، کەچی بە بێ زانین، ویستینش پێک نایە، کێ شتێک نەناسێ یان نەیزانێ، دەیەوێ؟ ویستن ئەوەیە کە مەبەست دەبزوێنێ و دەیگرێتە بەر کار؛ مەبەست، دۆز و تەما و نیازیشی پێ دەڵێن و هەر سێکیان یەک شتن.

مەبەست -کە مرۆڤ بۆ کارێک هان دەدا- جاری وا هەیە یەک شتەو جاریش هەیە دوو شتە:

**ئەو مەبەستەی کە یەکە**، پیێ دەڵێن بێخەوش. ئەمە وەکوو ئەوەیە کە کەسێک دانیشتبێ، شێرێک هەڵمەتی بۆ بدا، ئەمیش هەستێ و راکا. مەبەست و نیازی ئەم کەسە هەر یەک شتە: ئەوەش هەلاتنە. هەروەها گەر پیاوێکی بەڕێز بێتە ژووری، بۆ رێزلێنانی رادەبێ و بێجگە لە رێزگرتنی ئەو کەسە هیچ مەبەستێکی تری نییە. ئەمە بێخەوشە.

گەر مەبەست دووان بێ، دەبێتە سێ جۆر:

**یەکەم** ئەوەیە کە هەر مەبەست بە رادەیەک گرینگە و گەر تەنیاش بایە، هەر بۆ ئەو کارەی هەڵدەخراند. وەکوو ئەوەی کە خزمێکی هەژارت داوای پارەت لێ کا؛ تۆش هەم لەبەر هەژاری و هەمیش لەبەر خزمایەتی پێی دەدەی؛ بۆ خۆشت دەزانی کە گەر تەنیا خزم بایە و هەژاریش نەبایە پێت دەدا، یان گەر تەنیا هەژار بایە و خزم نەبایە دیسان پێت دەدا و هەر یەک لەوانە بە تەنیایی ئەوەندە گرینگن کە کارەکەت بۆ پێک دێنا.

**جۆری دووەم** ئەوەیە کە دەزانی گەر خزم بایە و هەژار نەبایە، یان هەژار بایە و خزم نەبایە پێت نەدەدا؛ بەلام چونکە هەردووکیان پێکڕا کۆوە بووگن، کاری بۆ پێک دێنی. وێنەی یەکەم وەکوو ئەوەیە کە دوو کەس پێکەوە بەردێک هەڵبگرن کە هەر یەکیان بە تەنیاییش پێی دەکرا هەڵیبگرێ؛ بەلام جۆری دووەم وەکوو دوو کەسی لاوازن کە پێکەوە بەردێک هەڵبگرن و گەر تەنیا بایەن، پێیان هەڵنەدەگیرا.

**سێیەم** ئەوەیە کە مەبەستێک لاواز بێ و بە تەنیا هیچی پێنەکرێ و ئەویتریان بەهێز بێ و بە تەنیا خۆیشی کاری پێ پێک بێ، بەلام بوونی مەبەستی لاواز، وزەو هازی زۆرتری دەداتێ. وەکوو ئەوەی کە کەسێک بە تەنیا خۆیشی شەونوێژ کا، بەلام گە تاقمێکیش لەوێ بن، ئاسانتر و بە گوڕتر

دەیخوێنێ؛ هەرچەند بۆ ڕەزای ئەوان نایخوێنێ، بەڵکوو لەبەر خاتری خودا و پاداشی ڕۆژی پەسڵان دەیخوێنێ. ئەمە وەکوو ئەوەیە پیاوێکی بەشان و باهۆ بە تەنیاش بتوانێ بەردێک هەڵبڕێ، گەر لاوازێکیش ئاریکاری بێ، بۆی ئاسانترە.

هەر یەک لەمانە دەستوورێکی جیاوازی هەیە و لە دلبێشیدا دێتە گوتن. مەبەست ئەوەیە کە بزانی واتای نییەت، مەبەست، هۆ و دنەدەرو بزوێنەرە. ئەمە برێ جار بێخەوشەو برێ جار تێکەڵاوی هەیە.

**سەرنج:**

بزانە پێغەمبەر فەرمووی: «نِیَّةُ المُؤمِن خَیرٌ مِن عَمَلِه»؛ مەبەستی بڕوادار چاتر لە کردەوەیە. بەمە نەیویستووە کە بڵێ مەبەست بێ کردە چاکترە لە کردەی بێ مەبەست، چونکە ئاشکرایە کە کردەی بێ مەبەست عیبادەت نییە، کەچی مەبەستی بێ کردە، عیبادەتە؛ بەڵکوو ویستوویە ئەمە بسەلمێنێ کە عیبادەتی بڕوادار بە لەشەو بە دڵ، ئەمەش دوو کەرتە؛ لەم دووانە ئەوەی کە دڵی دەگەڵە چاترە. هۆکەشی ئەوەیە کە مەبەست لە کردەوەی لەش، ئاڵوویری دڵە و مەبەست لە نییەت و کردەوەی دڵ ئەوە نییە کە لەش بگۆڕێ. خەڵکی وا دەزانن کە مەبەست و نییەت بۆ کردەوەیە، کەچی ڕاستیەکەی بە ئاوەژووی ئەمەیە، واتە کردەوە بۆ مەبەست و نییەت و گۆڕانی دڵە، چونکە دڵ بەرەو ئەو جیهانە کۆچ دەکا و بەختەوەری و بەختڕەشی بۆ دڵە؛ لەشیش هەرچەن لە ناودایە، بەڵام پێڕەوی دڵە. وەکوو حوشتر، هەرچەن حەج بێ حوشتر سەرناگرێ، بەڵام حوشتر حاجی نییە. گۆڕانی دڵ یەک شتە: ئەوەی کە لە دونیاوە بەرەو دواڕۆژ ڕووی وەگێڕێ، تەنانەت لە دونیا و دواڕۆژەوە بەرەو خودا ڕووی وەرگێڕێ. ڕووی دڵ، هەمان مەبەست و نییەتە. چونکە حەز بە دونیا بەسەر دڵدا داسەپاوە، زۆرتر ڕووی بەرەو دونیایە. هەر لە سەرەتای ڕسکانی مرۆڤەوە، زۆرتر هۆگری پێوەندی دەگەڵ دونیایە. بەڵام کە پاپای دیداری پەروەردگاری کەوتە دڵ و بە سەریدا زاڵ بوو، دڵ گۆڕانی بە سەردا دێ و ڕووی بەرەو خودا وەردەگێڕێ. کەواتە مەبەست لە هەموو کردەوەیەک گۆڕانی دڵە: مەبەست لە کڕنۆش ئەوە نییە کە جەمین لە ئاسمانەوە بەسەر زەویدا بنوسێ، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە لووتی فیز و دەمار بشکێنێ. مەبەست لە «الله اکبر» چەرخاندنی زمان نییە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە دڵ گۆڕانی بە سەردا بێ و بە جێی کڕنۆش بۆ خۆ بردن، سەری لە ئاست پەروەرندەی نەوی بکا. مەبەست لە بەردهاویشتنی حەج ئەوە نییە کە وردە بەرد لە شوێنێکدا کۆما بکرێ، یاخۆ دەست بجووڵێ، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە دڵ بپەرژێتە سەر بەندەگی خودا و ڕەدووی هەوای نەفس نەکەوێ و سەری لە ئاست ئاوەز نەوی کا و گوێ بە فەرمانی ئاوەز بێ و هەوساری خۆی پێی بسپێرێ. هەروەک گوتی: «لَبَّیکَ بِحَجَّةٍ حَقّاً وَ تَعبُّداً وَرَقّاً». مەبەست لە قوربانی ئەوە نییە

کە گیان لە مەڕێ بستێنی، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە دڵ لە ڕژدی و چاونەزێری پاکژ کەیتەوە و بە گوێرەی سروشتت بەزەییت بە گیانداراندا نەیێ، بەڵکوو بە گوێرەی دەستوور دەبێ بجویتەوە، تا کاتێ گوتیان ئەو مەڕە بکوژە، نەڵێی ئەو زمان بەسراوە چی کردووە و بۆچی ئازاری بدەم، دەبێ چش لە خۆت بکەی و لە نەبووندا ڕۆبچی، لە ڕاستیدا لە ئاست خۆتدا نامێنی و لە پەرەوەرندەتدا نوقم دەبی و مەستی دەستی دەبی و هەر لەویشدا دەتوێتەوەو لە بوونی ئەودا بزر دەبێ. هەموو عیبادەتەکانی‌تریش هەر ئاوەهان.

دڵ بە چەشنێ ڕسکاوە کاتێ حەز و تاسەو تامازرۆییەکی تێدا دێتە دی، گەر لەش لەوەدا ئاریکاری بێ، ئەو دانستەیەی تێدا پتەوتر و قایمتر دەبێ. بۆ وێنە، گەر بەزەیی سێوییەک لە دڵدا بێتە دی، گەر دەستی بەزەیی و دلۆڤانی بەسەر هەتیوێکدا بێنی، ئەو تایبەتمەندییەت لە دڵ پتەوتر دەبێ و دڵیش شارەزاتر دەبێ. هەروەها کاتی لە واتای خۆبەکەمگری گەیشتی، بەسەریشت ئاریکاری بە و سەرت نەوی کەی. دۆزو مەبەستی خێر و چاکەی هەموو عیبادەتەکان ئەوەیە کە ڕوو لە دونیا وەگێڕی و لەسەر ڕێبازی دوارۆژ بی، بە پێی ئەو دۆزە جوولانەوەو لەسەر ئەو ڕیبازە کەوتنەڕێ، ئەو دۆزە پتەو و قایمتر دەکا. کەواتە، کردەوە بۆ سەلماندنی ویست و مەبەستە، هەرچەند بۆ خۆیشی لە مەبەستەوە دێتە دی. کەوابوو، ئاشکرایە کە مەبەست باشتر لە کردەوەیە. چونکە مەبەست لە خودی دڵایە، کەچی کردەوە لە شوێنێکی‌ترەوە دەگاتە دڵ: گەر گەیشتە دڵ، ئەوە بە کەڵک دێ، بەڵام گەر نەگاتە دڵ ئەوە بەفێڕۆ چووە، کەچی نییەتی بێ کردەوە، بە فێڕۆ ناچێ. ئەمە وەکوو ئەوەیە کەسێک گەدەی ژان کاو دەرمانێ بخوا تا چاک بێتەوە؛ کە دەرمانی خوارد بێ‌شک دەگاتە گەدەی و کاریگەر دەبێ، یان بە دەرمان سەر سنگی بهەنوێ، ئەمەش ڕەنگە بەسەر گەدەیدا کاریگەر بێ، بەڵام ئەو دەرمانەی کە ڕاستەوخۆ دەگاتە مەعدە چاتر و بەکەڵکترە؛ دەرمانێ کە بەسەر سنگدا دەیماڵن، بۆ دەرمانی مەعدەیە نەک سنگ، بەڵام گەر بەسەر گەدەدا کاریگەر نەبێ، ئەوە بە فێڕۆ چووە؛ کەچی ئەوەی کە دەگاتە مەعدە، هەرچەن نەگەیشتۆتە سنگ، بەڵام بە فێڕو نەچووە.

## شرۆڤەی ئەو وازوازی و بیرەپیسانەی کەنابنەگوناح و بەخشراون و ئەوانەی کەگوناحن و نەبەخشراون

پێغەمبەر فەرمووی: ئوممەتی من لە هەرچی وازوازی و بیری خراپە، بەخشراوە و عەفوو کراوە (لە هەر دوو سەحیحدا هاتووە[1]) و هەرکەس نیازی گوناحی بێ و نەیکا، پەروەردگار بە فریشتەکان دەڵێ بۆی مەنووسن؛ گەریش بیکا، بە گوناحێک بۆی دەنووسن. بەڵام گەر نیازی چاکەیەکی بێ،

---

[1] ـ سەحیحی موسلیم و سەحیحی بوخاری.

پاداشێکی بۆ دەنووسن -هەر چەن نەیکردبێ- کە کردی دە پاداشی بۆ دەنووسن. تەنانەت لە بڕی ئەخبارەدا تا حەوتسەد پاداش بێژراوە. لەم سۆنگەوە هەندێ کەس وایان زانیوە کە هەرچی بیری نەگونجاو و پیس بێ و بە دڵدا تێپەڕێ، گوناح نییە و لێیێ ناپرسنەوە؛ ئەمەش هەڵەیە، چونکە هەروەک بێژراوە دڵ بنەمایە و لەش لق و پۆ.

پەروەردگار دەڵێ: گەر ئەوەی لە دڵتدایە، ئاشکرای کەی، یان بیشاریتەوە، لەمەڕ ئەوە لێتان دەپرسنەوە.وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ [1] ٱللَّهُ؛ هەروەها دەڵێ لە چاو و گوێ و دڵیشتان دەپرسنەوە: «إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ [2] مَسْـُٔولًا. هەروەها دەڵێ ئەو سوێندانەی کە بۆ چاوڕاو بەزارتاندا دێ، ناپرسنەوە، بەلام ئەوەی بە دڵدا دێ لەهەمبەری بەرپرسیارن: لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ [3] قُلُوبُكُمْ؛ هەروەها هەموو زانایان لەسەر ئەمەی کە لووتبەرزیو مەراییو رووبینیو خۆبەزلزانی گوناحە و لێی دەپرسنەوە، هاودەنگن و هیچ ناکۆکییەک نییە، ئەمانەش هەموو کاری دڵن.

کەواتە، دەبێ بزانی ئەوەی بە دڵدا تێدەپەڕێ چوار جۆرە: دوویان بەبێویستی مرۆڤن و لە بەرانبەری بەرپرسیار نییە و دوویان بە ویستی خۆیەو لە بەرانبەری بەرپرسیارە. ئەمە وەکوو ئەوەیە کە لە ڕێدا بڕۆی و ژنێک لە پشت سەرتەوە بێ و ئەم بیرانەت بە دڵدا بێ:

**یەکەم،** دەڵێ بگەڕێوە و سەیری کە، بەم بیرە دەڵێن ئاخافتنی نەفس.

**دووەم،** ئەویە کە حەزێک لە دڵدا دەجوێتەوە کە بگەڕێتەوەو سەیریکەی. بەمەش دەڵێن حەزی تەبع. ئەمە بزووتنەوەی شاوەتە.

**سێیەم،** ئەوەیە کە دڵ دەڵێ دەبێ بگەڕێتەوە و سەیریکەی. کاتێ دڵ ئەم دەستوورەدەدا کە شەرم یان ترسێک تەگەرەی تێ نەخا؛ چونکە وانییە کە هەرچی شاوەت داوای کا، دڵیش دەستووری لەسەر بدا و بیسەلمێنێ، بەڵکوو رەنگە لەبەر ترسێک یان هەر هۆیەکیتر، بڵێ ئەم کارە ناکرێ. بەمە دەڵێن دەستووری دڵ.

**چوارەم،** ئەوەیە کە کەمۆکێ نیازی گەڕانەوەو سەیرکردنی بێ و ئەم تەمایە گەر بە ترساندن لە خودا پووچەڵ نەکرێتەوە، خێرا دەبێتە بڕیار و کردەوە.

کەواتە، لەو دوو دۆخە سەرەتاییە کە بە ئاخافتنی نەفسی و حەزی تەبع ناومان لێ بردن،

---

١ ـ قورئان، ٢/٢٨٤.

٢ ـ قورئان، ١٧/٣٦.

٣ ـ قورئان، ٢/٢٢٥.

ناپرسنەوە، چونکە بە ویستی خۆی نییە و پەروەردگار فەرموویە: لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا [1]وُسْعَهَا. ئاخافتنی نەفس بەم جۆرەیە کە عوسمان کوڕی مەزعوون بە پێغەمبەری گوت: «نەفسم دەڵێ خۆت بخەسنە یا لە شاوەت رزگارت بێ». فەرمووی: «وامەکە، خەساندنی ئوممەتی من، رۆژوو گرتنە». گوتی: «نەفسم پێم دەڵێ گۆشت مەخۆ». فەرمووی: «نە، چونکە من زۆرم حەز لە گۆشتەو گەر بۆم دەست کەوێ دەخۆم و گەریش بمەوێ خودا پێم دەدا». گوتی: «نەفسم پێم دەڵێ لە خەڵک دووربگرەو لە کێودا بژی». فەرمووی: «مەڕۆ، رەهبانییەتی ئوممەتی من حەج و خەزایە». ئەم بیرانە کە بۆی هاتنە گۆڕێ، ئاخافتنی نەفسە. ئەمەش گوناح نییە، چونکە تەمای جێبەجێ‌کردنی نەبووەو بەرلەوە هاتووە راوێژێ بکا.

بەڵام ئەم دوانە کە بە ویستی مرۆڤە و دەستووری دڵ بۆ جێبەجێ کردنیە، گوناحە و لێی دەپرسنەوە؛ هەرچەند بە هۆی شەرم و شوورەیی و ترس و هەر هۆیەکی‌تر بێجگە لە خوداوە، نەیکا. مەبەست لەم پرسینەوەیە، ئەوە نییە کە کەوتۆتە بەر تووڕەیی و تۆڵەی پەروەردگار، چونکە بینایی چاوان لە تووڕەیی و تۆڵە ئەستاندن بە دوورە؛ بەڵام واتای ئەمەیە کە بەم مەبەست و دۆزە، دڵی دۆخێکی بۆ دێتەدی کە لە پەروەردگاری دوور دەبێ. ئەمەش سەرچاوەی چارەڕەشییە، چونکە هەروەک پێشتر بێژرا، بەختەوەری مرۆڤ لەوەدایە کە رووی دڵ لە خۆی و دونیا بەرەو پەروەردگار وەربگێڕێ. کەچی هەر ویست و تەمایەک لە دونیا، بە دونیای نزیکتر دەکاتەوەو لەوەی کە دەبێ نزیک بێ، دوورتری دەکاتەوە. واتای ئەمەی کە دەڵێن لێی پرسرایەوە و کەوتە بەر لەحنەت، ئەوەیە پتر گیرۆدە بوو و لە خودا دوورتر کەوتەوە، ئەمەش کارەساتێکە لە خۆی و بۆ خۆی و بەسەر خۆیدا، نەکەس لە عیبادەتی شاگەشکە دەبێ و نە کەس لە گوناحی تووڕە و زویر تا تۆڵەی لێ بستێننەوە. بەڵام دەبێ هەر پەیڤێ بە گوێرەی ئاوەزی خەڵک بێ.

هەرکەس لەم نهێنیانە گەیشت، بێ‌گومان لە ئاست مەبەستی دڵ بەرپرسیارە و بەڵگەش بۆ ئەم پەیڤە ئەوەیە کە پێغەمبەر فەرمووی: «دوو زەلام کە شیر بۆ یەکتری بکێشن و یەکیان بکوژرێ، کوژرا و کوشندە، پێکڕا لە دۆژەهن». گوتیان: «دەی کوژراو بۆچی؟» فەرمووی: «چونکە ئەمیش گەر پێی بکرایە، ئەویتری دەکوشت». هەروەها گوتی: «پیاوێ سامانێکی هەیە و بە گوێرەی زانست خەرجی ناکا، یەکێکی‌تر دەیبینێ و دەڵێ گەر منیش بمبایە، هەروام خەرج دەکرد. هەردوویان گوناحبارن». ئەمانەش هەموو نیازی دڵن. بێ‌شک، گەر کەسێک ژنێ ببینێ لە بەرگی خەوداو پێی وابێ ژنێکی نامۆیە و دەگەڵی بنوێ، گوناحبارە، هەرچەن ژنی خۆی بێ. هەروەها گەر کەسێک بەبێ‌دەسنوێژ، نوێژ بکاو پێی وابێ دەسنوێژی هەیە، پاداشی هەیە، بەڵام گەر کەسێک پێی وابێ

---

1 ـ (قورئان، ٢٨٦/٢) خوا ئەرکی لە توانا بەدەر، بەسەر کەسدا ناسەپێنێ. (هـ)

دەسنوێژی نییەو نوێژ کاو پاشان بزانێ کە دەسنوێژی بووە، ئەوە گوناحبارە. هەموو ئەمانەش، بارودۆخی دڵن.

بەڵام گەر کەسێک نیازی خراپەی بێ و لەبەر ترسی خودا نەیکا، هەروەک لە خەبەردا هاتووە، بە چاکە بۆی دەنووسن. چونکە نیازەکە هاورێ لەگەڵ ویستی تەبعە و واز لێهێنانی بە ئاوەژووی تەبعە و خەبات دەگەڵ نەفسە و بۆ روونکردنەوەی دڵ پتر لەو نیازە کە دڵی رەش دەکردەوە، کاریگەرە. مەبەست لە نووسینی چاکە هەر ئەمەیە. بەڵام گەر ئەو گوناحەی پێ نەکرابێ و بۆ داشۆردنی ئەو مەبەستە هیچ کەفارەیەکی نەدابێ، ئەو هەڵە و پەڵەیەی لە دڵ نارِەوێ و هەر لێی دەپرسنەوە. وەکوو کوژراوێک کە لەبەر بێگیانی، کوشندەکەی خۆی پێ نەکوژرێ.

## شرۆڤەی ئەو کردەوانە کە بە نییەت ئاڵ و وێر دەبن

کردەوەکان سێ جۆرن: کردەوەگەلی رەوا، گوناح و عیبادەت.

رەنگە برێ کەس بە گوێرەی ئەم پەیڤەی پەیغەمبەر کە فەرمووی: «اِنَّما الاعمالُ بِالنِّیات»، وا بیر کەنەوە کە گوناحێ کە بە مەبەستی چاکەوە بکرێ، عیبادەتە. ئەمە هەڵەیە. مەبەست لەم پاژەدا هیچ کاریگەر نییە، هەرچەن مەبەستی خراپ، کارەکە کرێتتر دەکا. ئەمە وەکوو ئەوەیە کەسێک، خوسپە بکا بۆ شادکردنی کەسێکیتر؛ یان مزگەفت و قوتابخانە و کاروانسەرا چێ بکا لە پارەی حەرام و بلێ مەبەست چاکەیە. ئەمە نازانێ کارەکەی چاکە نییە، چونکە مەبەستی چاکە لە کاری خراپەدا، خۆی خراپەیەکیترە. گەر بزانێ و بیکا، خراپکارە و گەر نەزانێ و وا بزانێ کە چاکەیە، دیسان خراپکارە؛ چونکە زانین فەرز و پێویستە. هۆی زۆربەی زیانی خەڵک، نەزانییینە. لەم سۆنگەوە سەهلی توستەری گوتوویە کە هیچ گوناحێ لە نەزانی گەورەتر نییەو نەزانینی نەزانی، لە نەزانی گەورەتر. چونکە گەر نەزانێ کە نازانێ، قەد فێر نابێ و ئەمە دەبێتە کۆسپ و تەگەرەیەک بۆی. هەروەها گەر شاگردێک لە مالی قازی و ئەوقاف و مالی سێوی و سولتان دەرس بخوێنێ تا پارە کۆوەکا و خەریکی خۆ هەڵکێشان و رکەبەرێ بێ، ئەوەش حەرامە. گەر مامۆستا بلێ کە مەبەستی من گەشەی شەرعە و گەر ئەو بۆ خراپەی بەکار دێنێ، پێوەندی بە منەوە نییە و من لە مەرِ مەبەستی خۆم بەرپرسم، ئەمە نەزانی تەواوە؛ ئەمە وەکوو کەسێکە کە شمشێر بە کەسێک دەدا کە جەردەیی پێ دەکا و رێی پێ دەگرێ، یان ترێ دەداتە کەسێک کە دڵنیایە دەیکاتە شەراو، کەچی بلێ مەبەستی من دڵاوایی و دڵفراوانییە؛ چونکە پەروەرندەم کەسی پتر لە دڵاوا خۆش ناوێ. هۆی ئەم پەیڤە نەزانییە. تەنانەت گەر بزانێ ئەو کەسە بەو شیرەی رێ دەبرێ، دەبێ لە چنگی دەر بێنێ، کەی رەوایە کە پێی بدا؟ هەموو پێشوونان لە زانای گوناحکار هانایان دەبەر خودا بردووەو هەر

شاگردێ کە ئاسەواری گوناحیان تێدا بە دی کردووە، لە کۆڕی دەرسیان وەدەرناوە. تەنانەت ئەحمەدی‌حەنبەل شاگردێکی گەورەی خۆی وەدەرنا، چونکوو دەرەوەی خانووەکەی کاگڵ کردبوو. گوتی: «بە قەدەر نینۆکێ لە شارێی موسوڵمانانت گرتووە، شیاوی ئەوە نیت زانستت پێ فێر بکرێ». کەواتە، گوناح بە مەبەستی چاک، نابێتە چاکە و خێر هەر ئەوەیە دەستووری شەرعی لەسەر بێ.

**کەرتی دووەم عیبادەت:** نییەت لەمەدا لە دوو ڕەهەندەوە کاریگەرە: یەکەم، بناغەی عیبادەت بە نییەت دادەمەزرێ؛ دووەم هەرچەند مەبەست و نییەت زۆرتر بێ، پاداشی زۆرتر دەبێ. هەرکەس زانستی نییەت بزانێ، دەتوانێ بە عیبادەتێ دە نییەتی چاک بێنێ، تا ئەو عیبادەتەش بێتە دە عیبادەت. بۆ وێنە، گەر لە مزگەفتدا زاویەی گرت: وا بلێ کە ئەم خانووەی خودایەو هەرکەس بێتە ناوی، بۆ سەردانی خودا هاتووە، پێغەمبەر گوتی: هەرکەس بڕواتە نێو مزگەوتەوە، بۆ سەردانی خودا هاتووە و دەبێ سەرلێدراو ڕێزی سەر لێدەر بگرێ. **دووەم،** ئەوەیە کە چاوەنۆڕی نوێژیتر دەکا، چونکە لە خەبەردا هاتووە کە: «هەرکەس چاوەڕوانی نوێژ کا، لە نوێژایە». **سێیەم،** مەبەستی ئەوە بێ کە بەم کارەی، چاو و گوێ و دەست و زمان و قاچی لە ڕۆیین و بزووتن بپارێزێ و ئەمەش جۆریک لە ڕۆژووە؛ چونکە لە خەبەردایە کە «مانەوە لە مزگەوت، ڕەهبانییەتی ئوممەتی منە». **چوارەم،** لە کاروباری دوور بگرێ تا سەر لە بەری لەش و گیانی بە خودا بسپێرێ و خەریکی بیرووبر و یادی خودا بێ. **پێنجەم** ئەوەیە کە لە تێکەڵاوی و شەڕی مەردم خۆ بپارێزێ. **شەشەم** ئەوەیە کە لە مزگەفتدا لە خراپە بەرگری بکا و بۆ چاکە فەرمان بدا و گەر کەسێک خراپ نوێژی کرد، ڕێنوێنی بکا و پێی فێری بکا. **حەوتەم** ئەوەیە کە ڕەنگە لە مزگەفتدا کەسێکی دیندار ببینێ و بێتە برادەری؛ چونکە مزگەوت جێی ئۆقرەگرتنی دیندارانە. **هەشتەم** ئەوەیە کە لە ماڵی پەروەردنەیدا شەرم دەکاو لەڕووی هەڵنایە گوناح بکا، یان بیری خراپی بە مێشکدا تێپەڕێ. بەم پێیە هەموو عیبادەتەکانی‌تر هەڵسەنگێنە و لە هەر عیبادەتێکدا دەتوانی چەن مەبەست ڕەچاوکەی و پاداشی زۆرترت دەسکەوێ.

**کەرتی سێیەم** کارگەلی ڕەوایە. هیچ مرۆڤێکی ژیر و زانا، نەزانانە و چوارپێیانە خۆی لە کارگەلی ڕەوا وەرنادا و لە مەبەستی چاک خافڵ نابێ، چونکە ئەوە زیانێکی ئێجگار گەورەیە و لە هەموو ئەوانەش دەپرسنەوە و مرۆڤ لە ئاستیان بەرپرسە.

گەر مەبەستی چاک بێ، بە قازانجییە گەر خراپ بێ بە دژییە، ئەگینا هیچیان لە هیچ و کەسیان لە کەس؛ بەڵام ئەو کاتەی کە بەم کارەی بواردووە، بە فێڕۆی داوە و هیچ کەڵکێکی لێ نەکڕاندووە و بە ئاوەژووی ئەم ئایەتە کاری کردووە: وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ

إِلَيْكَ[1] واتە: دونیا خەریکی بکارە، بەشی خۆتی لێ بستێنە تا دەگەڵت بمێنێتەوە. پێغەمبەر گوتی: «مرۆڤ لە بەرانبەر هەموو کارێکی بەرپرسیارە، تەنانەت لە بەرانبەر چاوڕەشتنێ یان کلۆوە خاکێک کە بە قامیکدا دەیمالێ یان دەستێ کە بە بەرگی هەواڵێکیدا رایدەکێشێ».

زانستی نییەتی کارگەلی ڕەوا، تێروتەسەلە، دەبێ ئەوەش فێر بکرێ. وەکوو ئەوەی کە بۆن و بەرامەی خۆش بەکاربردن ڕەوایە و ڕەوایە کەسێک ڕۆژانی هەینی خۆی بۆن خۆش کا، بەڵام ڕەوا نیە کەسێک بە مەبەستی خۆهەڵکێشان و لووتبەرزی، یان مەرایی و یاخۆ لە نێو دڵی ئافرەتاندا جێ‌کردنەوە بە کاری بێنێ. بەڵام مەبەستی چاکە ئەوەیە کە ڕێزی خانووی خودا بگرێ و نیازی ئاسوودەگی هاوسێکانی بێ و ئەوە بێ کە بۆنی ناحەز لە خۆ دوورکاتەوە تا خەڵک و خوا وەڕس نەبن و تووشی خوسپەیان نەکا؛ نیازی ئەوە بێ کە مێشکی بەهێزتر و بێ‌خەوشتر بێ و پتر هۆگری یاد و ویری پەروەرندەی بێ. ئەمانەی بێژرا و شتی ئاوەها بەسەر دڵی ئەو کەسەیدا کە نیازی چاکە بێ، زاڵ دەبێ و لەهەر یەک لەمانە، هەنگاوێ لە بینایی چاوان نزیک دەکەوێ.

پێشوونان وایان کردووە کە بۆ هەر کارێ کە ویستوویانە جێ‌بەجێی بکەن، تەنانەت نان خواردن، ئاو دەستچوون و نزیکی دەگەڵ هاوسەریان، نییەتی چاکەیەکیان لە دڵدا بووە و هەر کارێکیان چاکەیەک بووە و پاداشێکیان دەس کەوتووە و هیچ هەڵێکیان نەفەوتاندووە؛ بۆ وێنە، مەبەستیان لە نزیک کەوتن دەگەڵ خێزانیان، منداڵ بووە، چونکە منالداربوون پتر بوونی ئوممەتی مستەفایە؛ هەروەها مەبەستی کاژێری خۆی و خێزانیەو بەرگری لە تووشیاری گوناح بوونە.

جارێک سەفیانی سەوری کراسەکەی بە ئاوەژوو دەبەر کردبوو. پێیان گوت. ویستی چاکی کا، پەژیوان بۆوە و هەروای هێشتەوە و گوتی: «ئەمەم بۆ خودا دەبەر کردووە، نامەوێ لەبەر ناخودا ڕاستی کەمەوە». جارێک زەکەریای نەبی لە شوێنێکدا کرێکار بوو، تاقمێ هاتنە لای، خەریکی نانخواردن بوو، خولکی نەکردن، پاشان کە بە تەواوی نانەکەی خوارد، گوتی: «گەر بە تەواوی ئەم نانەم نەخواردایە، نەمدەتوانی بە جوانی ئەم کارەیان جێ‌بەجێ کەم. لە بەر نەریتی مێرخاسی، فەرزەکەمم لە دەس دەچوو».

سەفیانی‌سەوری نانی دەخوارد، یەکێک هاتە ژوورێ، خولکی نەکرد و خۆی هەمووی خوارد. پاشان گوتی: «ئەگەر ئەمەم قەرز نەکردایە، خولکم دەکردی». دیسان گوتی: «هەرکەس بە کەسێکی دی بڵێ بخۆ و بە دڵ پێی ناخۆش بێ، گەر ئەو کەسە نەیخوا، گوناحێکی کردووە و ئەوەش ڕووبینیە؛ گەر خواردی دوو هەڵەی کردووە: یەکەم ڕووبینی و ئەویتریان ئەوەیە کە کەسێکی بۆ

---

[1] ـ قورئان (٧٧/٢٨).

خواردنی شتێک هان داوە کە گەر لە دڵی ئاگەداربایە نەیدەخوارد، بەم جۆرە خەیانەتی پێ کردووە».

## شرۆڤەی ئەمەی کەنییەت بەویستی خۆ نییە

ڕەنگە مرۆڤی دڵ ساکار کە ژنەوتی بۆ هەر کارێکی ڕەوا، نییەتێ پێویستە، بە زمان بڵێ کە نیازمە ژن بێنم بۆ ڕەزای خودا، یاخۆ نان بخۆم بۆ پەروەرندەم، یان وانە بڵێم و کۆڕێک پێک بێنم بۆ خاتری خودا و پێی وایە ئەمە نییەتە؛ کەچی ئەمە قسەی زمانە، یا ئاخافتنی نەفسە. چونکە مەبەست و نییەت، ئامازرۆییەکە کە لە دڵدا دێتە دی و پیاو بۆ کارێ هان دەدا.

وەک داواکارێک کە گرۆ بە لەش دەگرێ و دنەی دەدا تا بۆ جێبەجێ‌کردنی کارێک ڕابێ. ئەمەش کاتێک دەبێ کە مەبەست پێک بێ و بەسەر لەشدا زاڵ بێ. گەر ئەم داواکارە نەبوو، نییەت بە پەیڤین وەکوو ئەوەیە کەسێک تێر بێ و بڵێ نییەتم هەیە کە برسی بم، یان لە بیری کەسێکدا نەبێ و بڵێ نییەتم هەیە کە خۆشیم بوێ، ئەمەش قەد نابێ. هەروەها گەر کەسێک شاوەت دنەی بدا توخنی خێزانی کەوێ، کەچی بڵێ نیازم لە نزیکی دەگەڵ خێزانم، منداڵە، ئەم نییەتەش هیچ کەڵکی نییە. هەروەها گەر کەسێک پاپای ژن‌هێنانی شاوەت بێ و بڵێ بۆ خاتری سوننەتی شەرع ژن دێنم، ئەوەش بێ کەڵکە. بەڵکوو دەبێ سەرەتا بڕوای بە شەرع بەهێز کا، پاشان لەو خەبەرانەی کە لەمەڕ ژن‌هێنان هاتوون، ڕامێنێ، تا پاپای ئەو پاداشەی لە دڵدا بجوێ و بۆ ژن‌هێنانی دنەبدا. ئەمە بە بێ ئەوەی بەزار ببێژرێ، نییەتە. هەروەها هەرکەس هەستی فەرمانبەرداری بۆ نوێژی ڕاوەستێنێ، ئەمە خۆی نییەتە و گوتنی ئەمەی کە «مەبەستم هەیە»، هیچ کەڵکی نییە. وەکوو ئەوەی کەسێک برسی بێ، هیچ پێوست ناکا بڵێ نییەتم هەیە نان بخۆم بۆ برسییەتی، چونکە کە برسی بوو، بە ناچارخواردن لەبەر برسیەتییە. هەروەها هەر کات پاپای نەفس هاتە کایەوە، نییەت بۆ دواڕۆژ بە ئەستەم بێتە دی. مەگین ئەوەی بیری دواڕۆژی بەسەر دڵدا داسەپابێ.

مەبەست لەم باسە ئەوە بوو کە بزانی نییەت ئەوە نییە کە بە دەستی تۆ بێ. چونکە مەبەست، ئەو ویستەیە کە بۆ کارێکت هان دەدا. هەروەها کاری تۆ بە ویستی خۆتە، گەر بتهەوێ دەیکەی و گەریش نەتەوێ نایکەی؛ بەڵام ویستی تۆ، بە دەستی خۆت نییە تا گەر بتەوێ، بتەوێ و گەریش نەتەوێ، نەتەوێ؛ هۆی هاتنەدی ویستیش ئەوەیە کە بڕوات دێتە سەر ئەمەی کە گەرەکی تۆ لەم دونیا یان لەو جیهانی‌تردا بە کارێکەوە بەسراوە و پاپای ئەو نیازەت بۆ دێتە دی. جا ئەوەی کە لەم نهێنیانە نەزانێ، چونکە نییەتیشی بۆ نایەتە دی، گەلێک عیبادەتی بەر ناکەوێ.

ئیبنی سیرین لەسەر تەرمی حەسەنی بەسری نوێژی نەکرد، گوتی: «نییەتێ نابینمەوە». هەروەها بە سەفیانی سەورییان گوت لەسەر تەرمی خەمماد کوڕی سلەیمان - لە زانایانی کووفە - نوێژ

دەکەی؟ گوتی: «گەر نیەتم بایە، دەمکرد». کەسێک داوای دوعای بەخێری لە تاووس کرد، گوتی: «ڕاوەستە تا مەبەستێکم بۆ بێتە دی، ئەوسا سکالاَت بۆ دەکەم». کە تکایان لێ دەکرد حەدیسیان بۆ بگێڕێتەوە، برێ جار نەیدەگێڕایەوە و هەندێ جاریش گزوگومەت دەیگێڕاوە و دەیگوت: «چاوەنۆڕی نیەت بووم کە بۆم بێتە دی». یەکێک گوتی: «یەک مانگە چاوەڕوانی هاتنە دی نییەتێکم کە سەردانی فلان نەخۆش کەم و بۆم نەهاتۆتە دی».

بە کورتی، تا کەلکەلەی دین و ترس لە خودا بەسەر کەسێکدا زاڵ نەبێ، لە هیچ خێرێکدا نییەتی بۆ نایەتە دی، تەنانەت لە فەرزەکانیشدا بە دژوار نییەت دێتە دی، تەنانەت ڕەنگە تا بیر لە ئاوری دۆژەەنەکاتەوەو خۆی لێ نەترسێنێ، نییەتی بۆ پێک نەیێ. کە کەسێک ئەم ڕاستیانەی لێ خویان بوو، ڕەنگە واز لە کارگەلی بەرزتر بێنی و بپەرژێتە سەر کارە ڕەواکان؛ چونکە ڕەنگە لە کارگەلی ڕەوادا نییەتی وا بێ کە کەسێک لە تۆڵە نەستاندنەوەدا هەیبێ و لە بەخشیندا نەیبێ و تۆڵەکردنەوە بۆ وی سەرتر و هێژاترە؛ هەروەها ڕەنگە کەسێک نییەتی شەونوێژی نەبێ، کەچی نییەتی شەوخەوتنی بێ تا بەیانی خێرا لە خەو ڕابێ و ئەو خەونە بۆی چاترە. هەروەها گەر لە عیبادەت ماندوو بێ و بزانێ گەر ماوەیەک لە لای خێزانی ڕاکشێ، یان دەگەڵ دۆستێکی بە ئاخافتن و گاڵتە و جەفەنگ ڕایبوێرێ، هێز و وزەی بۆ عیبادەت دەگەڕێتەو، ئەم ڕابواردنانەی بۆ سەرتر و هێژاترە تا ئەم عیبادەتە سست و بێهێزە. بوودەردا دەڵێ: «من جاربەجار خۆ لە ئاسوودەیی و ڕابواردن دەدەم تا لە عیبادەتی پەروەردگاردا بە گوڕتر بمەوە». عەلی دەڵێ: «کە دڵت بە نابەدڵی و بە بەردەوام پەرژاندە سەر کارێ، دڵت کوێر دەبێتەوە». ئەمە وەکوو ئەوەیە پزیشکێک بۆ دەرمانی نەخۆشێکی گەرم مەزاجی گۆشت بنوێنێ و ئەویش گوڕ و خوستی بەو دەرمانەی بگەڕێتەوە. یان وەکوو ئەوەیە کەسێک لە ڕیزی شەڕدا لەبەر دوژمن هەڵبێ، تا دوژمن بکەوێتە دووی، ئەوسا با بداتەوە سەریان و تەفر و تووناوایان کا؛ خەباتکاران لە خەباتدا زۆر وا دەکەن. ڕێبازی دین، هەمووی شەڕ و خەباتە لەگەڵ نەفس و لەگەڵ شەیتان؛ لەم شەڕەدا فێڵ و گزی پێویست دەبێ و ئەمەش لە لای گەورەکانی دین شیاو و لەبارە، هەر چەن زانایانی کەمزان لێی تێنەگەن.

### سەرنج

کە تێگەیشتی واتای مەبەست، هۆی کار و کردەوەیە، دەبێ بزانی هەندێ کەس ترس لە دۆژەهۆی کاریانە و هەندێکیتر گەیشتن بە بەهەشت. ئەوەی بۆ بەهەشت هان دەدا، بەندەی زگ و ژێری سکەو تێدەکۆشێ تا خۆی بخاتە شوێنێ کە ورگ و ژێر ورگی بحەسێنەوە؛ ئەوەش لەبەر ترس لە دۆژەکۆشەوە دەکا، وەکوو کۆیلەیەکی خراپە کە تەنیا لەبەر ترسی خێوەکەی کار دەکا. هەردووی

ئەمانە چ کاریکیان بە خوداوە نییە؛ بەندەی شیاو و لەبار ئەوەیە کە لە کاتی کار و چاکەدا نە چاوی لە دۆژەبێ، نە لە بەهەشت، بەڵکوو تەنیا لەبەر خودای بکات و بەس. ئەمە وەکوو ئەوەیە کەسێک سەیری گراوەکەی کا تەنیا لەبەر گراوەکەی، نەک لەبەر ئەوەی زێڕ و زیوێکی بداتێ؛ چونکە ئەوەی لەبەر زێڕ و زیو سەیری گراوەکەی دەکا، لە راستیدا گراوی زێڕ و زیوە. کەواتە، ئەوەی هۆگر و ئەڤینداری گەورەیی و جوانی پەروەردگار نییە، ئاوەها نییەتێکی لێ چاوەنۆڕ ناکرێ. ئەوەش کە وابوو، سەرلەبەری عیبادەتی تێرامانە لە جوانی پەروەردگاردا و ئاخاوتنە دەگەڵ ئەو: گەر بە لەش عیبادەت دەکا بۆ ئەوەیە کە گوێڕایەڵی خوداشی خۆش دەوێ؛ هەرگا کە ویستی، لەش و جەستەشی دەخاتە بەر ئازار و عیبادەتی پێ دەکا بۆ بینایی چاوان - بەو رادەی کە پێی دەکرێ - تا کۆسپێک لە هەمبەر رامان و ورد بوونەوە لە جوانی جوان خولقێندا بۆی پێک نەهێنێ؛ هەروەها بۆیە چش لە گوناح دەکا، چونکە دەزانێ کەوتنە دووی ئارەزووەکانی نەفس دەبێتە کوسپ و لەمپەرێک لە بەرانبەر دیداری ئازیز. زانای راستەقینە ئەمەیە.

ئەحمەدی خزرەوییە خودای بە خەو بینی. گوتی: «هەموو خەڵکی نیعمەتمیان دەوێ، بێجگە بوویەزید کە خۆمی دەوێ». شبلییان بەخەو بینی، گوتیان: «خودای مەزن چی دەگەڵ کردی؟» گوتی: «جارێک گوتبووم "چ زیانێ پتر لەوە کە بەهەشت بفەوتێ" تیزی تێگرتم و گوتی: "نە، چ زیانێ گەورەتر لەوە کە دیداری من بفەوتێ"». راستەقینەی ئەم دۆستایەتی و ئەم چێژە لە بەشی خۆشەویستی‌دا راڤە دەکرێ. گەر خودا بیەوێ.

## بەشی دووەم - باس لەهێژایی و راستەقینەو ناستەکانی دلبێشی

هێژایی دلبێشی دەبێ بەوەدا بزانی کە خودای گەورە و مەزن گوتی: وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ[1] هەروەها گوتی: أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ[2] فەرمووی: هیچ دەستوورێ بە خەڵک نەدراوە مەگین عیبادەتی بێخەوش؛ هەروەها دینی بێ‌خەش تەنیا بۆ خودایە و بەس. پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەردگار دەڵێ: دلبێشی نهێنیەکە لە نهێنییەکانم، لە دڵی بەندەیەکدا کە خۆشیم دەوێ دامناوە». پێغەمبەر بە مەعازی گۆت: «بە بێخەوشی کاربکە، تا نەختێکی بۆت بەس بێ». هەرچی لە لۆمە و خراپەی مەراییدا هاتە گوتن، هەمووی بۆ دلبێشی دەبێ، چونکە یەک لەو هۆکارانەی کە دلبێشی بە خەساردەدا، روانینی خەڵکە، هەر چەن هۆگەلی‌تریشی هەیە. مەعرووفی

---

١ ـ (قورئان، ٥/٩٨) فەرمانیشیان هەر ئەوەندە پێدرابوو کە ئەبێ خواپەرست بن و لەوین ئەودا دلپاک بن. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ٣/٣٩) تۆ بزانە دینی پاک هەر هی خوایە. (هـ)

کەرخی بە قەمچی لە خۆی دەیدا و دەیگوت: «یا نَفسِ اَخلِصی تَخلصی؛ بێخەوش بە تا دەرباز بی».
ئەبووسلەیمان دەیگوت: «خۆزگە بەوەی لە هەموو تەمەنیدا تەنیا هەنگاوێکی بە دلبێشی هەڵناوە، کە لەو دەمەدا بێجگە لە خوا چیتری نەویستبێ». ئەبوو ئەیووبی سەختیانی دەڵێ: «بێخەوشی لە مەبەستدا دژوارترە لە خودی مەبەست». یەکێکیان بەخەو بینی، گوتیان: «پەروەرندەت چی دەگەڵ کردی؟» گوتی: «هەرچیم بۆ خودا کردبوو لە نێو تای چاکەکانمدا بینیم، تەنانەت تۆمی هەنارێک لە نێو ڕێدا دامخستبوو و پشیلەیەک کە لە ماڵی مندا مردبوو. هەروەها هەودایەکی ئاوریشم کە لە نێو کڵاوەکەمدا بوو، ئەویشم لە تای گوناحەکانمدا بینی. کەرێکم تۆپی بوو، بایی سەد دینار بوو، ئەوەم لە تای چاکەکانمدا نەدی. گوتم: "ئەی پەروەرندەی پاک و مەزن! پشیلەکە لەسەر چاکەکانم بوو، بەڵام کەرەکەم نەبوو". گوتی: ڕۆیشت بۆ ئەو جێگای کە خۆت ناردت. کاتێ بیستت تۆپی، گوتت الا لعنةالله، بەڵام گەر بتگوتایە فی سبیل‌الله، لەسەر چاکەکانتدا دەتبینییەوە". لەڕێی خوا سەدەقەم دابوو، بەڵام چونکە لەو کاتەدا خەڵک سەیریان دەکردم، حەزم پێ دەکرد، ئەوانە نە خێریان بۆم بوو، نە زیان"».

یەکێک گوتی: «بۆ خەزا دەچووم، لە دەریادا هەڤاڵێکمان توورەکەیەکی دەفرۆت، گوتم دەیکڕم و کاری پێ دەکەم و لە فڵان شاردا دەیفرۆشم، قازانجیشم بۆ دەکا. ئەو شەوە لە خەومدا دووکەس لە ئاسمانەوە هاتنەخوار، یەکیان بەویتری گۆت ناوی خەزاکەرەکان بنووسە، هەروەها بنووسە فڵان‌کەس بۆ بازرگانی هاتووە و فڵان بۆ سەیران و فڵان‌کەسیش بۆ مەرایی هاتووە. پاشان سەیری منی کردو گوتی: "بنووسە ئەمەش بۆ بازرگانی هاتووە" گوتم: تو خوا چاتر سەیری کارم کە، من کە هیچ شتێکم نییە چۆن بۆ بازرگانی هاتووم؟ من بۆ خودا هاتووم. گوتی: بەڕێز! مەگەر ئەو توورەکەت بۆ قازانج نەکڕی؟ من گریام، گوتم: تو خوا! من بازرگان نیم. بەویتری گوت: بنووسە فڵان‌کەس بۆ خەزا هاتبوو لە سەر ڕێدا توورەکەیەکی کڕی تا قازانج بکا، با خودا خۆی بەو جۆرەی کە خۆی دەزانێ حوکمی لە سەرکا». بەم بۆنەوە گوتوویانە ساتێک دلبێشی ڕزگاری هەتاهەتایی لە دووە، بەڵام دلبێشی بە دەگمەن دەس دەکەوێ. دەڵێن بڕوا تووەو، کردەوە کشتوکاڵە و ئاوی ئاودێرانی، دلبێشی و بێخەویشیە».

دەگێڕنەوە لەبەنی ئیسرائیلدا پارێزکارێکی بەرز و هێژا بوو؛ پێیان گوت لە فڵان شوێن دارێک هەیە کە خەڵک دەیپەرەستن و کڕنۆشی دەبەردەبەن. زۆر تووڕە بوو، تەورێکی هەڵگرت و ڕۆیی تا ئەو دارە ببڕێ. ئیبلیس لە بیچمی پیرێکدا هاتە سەر ڕێی، گوتی بۆ کوێ؟ گوتی: دەڕۆم فڵان دار دەبڕم. گوتی: مەڕۆ، بەجێی ئەوە خەریکی عیبادەت بە، ئەوەت بۆ چاترە. گوتی: نە، ئەوە عیبادەتی منە. گوتی ناهێڵم و بەگژی یەکدا چوون. پارێزکار، ئیبلیسی بە عەرزدا دا و لەسەر سنگی دانیشت. ئیبلیس گوتی: وازم لێ بێنە تا شتێکت پێ بڵێم، گەر پەسندت نەکرد، ئەوسا هەرچی پێتخۆشە

بیکە. دەستی هەڵگرت. گوتی ئەی پارێزکار! تۆ پیاوێکی هەژاری و خەڵک خەرجت دەدەن، گەر شتێکت بێ بژیوت دابین کات و بتوانی خەرجی پارێزکارانیتر بدەی بۆت چاترە، چونکە گەر ئەو دارەش ببڕی، دارێکیتر دەچێنن و هیچ کەڵکی نییە، بەڵام من هەموو بەیانییەک دوو دینار دەنمە ژێر سەرینەکەت، ئەوەت بۆ چاترە و بپەرژە سەر عیبادەت. عابد راما و گوتی: راست دەڵێ، دینارێک بدەمە سەدەقە و دینارێک بدەمە هەژاران چاکترە، من چیمە بەسەر دار برینەوە، خۆ من پێغەمبەر نیم و ئەم کارەیان نەخستوومەتە ئەستۆ. گەڕایەوە. رۆژی دوایی لە خەو رابوو، دوو دیناری لەژێر سەرینەکەیدا بینی؛ رۆژی دواتریش هەروا. دینارێکی هەڵدەگرت و دینارێکی بە سەدەقە دەدا؛ گوتی چاکم کرد ئەو دارەم نەخست، من چم داوە لە دار برین. رۆژی سێهەم هیچی نەدی، تووڕە بوو، تەورەکەی هەڵگرت و رۆیشتەوە بۆ برینی ئەو دارە. لە رێدا تووشی ئیبلیس هات، گوتی بۆ کوێ؟ گوتی دەڕۆم ئەودارە دەبڕم. گوتی درۆ دەکەی، سوێند بە خودا کە قەد ناتوانی. بە شەڕ هاتن، پارێزکار کەوتە ژێر، وەکوو چۆلەکەیەک لە چنگی ئیبلیسدا گیر کەوت. گوتی یان بگەڕێوە، یان وەکوو مەڕ سەرت دەبڕم. گوتی وازم لێ بێنە، دەگەڕێمەوە؛ بەڵام شتێکم پێ بلێ، بۆچی ئەو جار من سەرکەوتم، کەچی ئەمجارە تۆ سەرکەوتی؟ گوتی: ئەو جار تووڕەییت لەبەر خودا بوو، پەروەردگار منی هێنایە ژێر ڕکێفت، چونکە هەرکەس لەبەر خودا کارێک بکا بە سەرمندا زاڵ دەبێ؛ بەڵام ئەمجار تووڕە بوونت نەک لەبەر خودا، بەڵکوو لەبەر دینار بوو، کەوتیتە دووی نارەزووی نەفست، ئەوەش بکەوێتە دووی ئارەزووی نەفسی، قەد بە سەرمندا زاڵ نابێ.

### راستەقینەی دلبێشی

کە نییەتت ناسی و زانیت هۆی ئەنجامدانی هەر کار، نییەتە و داواکاری هەر کارێک نییەتەو گەر یەک داواکار بوو پێێ دەڵێن بێخەوشی و گەریش زۆرتر بوو، بێخەوش نییە. وەکوو ئەوەی کەسێک رۆژوو لەبەر رەزای خودا دەگرێ، بەڵام بێجگە لەوە مەبەستیتریشی هەیە، وەکوو کەمترخواردن بۆ ئەوەی تەندروست بێ، یان خەرجی کەم بێ، یاخۆ بە جێی پەرژانە سەر چێشت لێنان، خەریکی کارێکیتر بێ و کەمتر بخەوێ؛ یان لەبەر رەزای خودا کۆیلەیەک رزگار کاو مەبەستیتری ئەوە بێ کە خۆی لە خەرجی ئەو کۆیلەیە دەربازکا، یان لە ئاکاری خراپی، خۆی بخەلسێنێ؛ یان سەفەری حەج بکات، تا بە هۆی سەفەرەوە بەهێزتر بێ و سەیری شار و بازێری جۆربەجۆرکا، یان بۆ ماوەیەک خۆی لە ژن و منداڵی داببڕێ و پشوویەک بدا، یان لە ئازاری دوژمنێکی هەڵبێ؛ یا شەونوێژ کا، تا خەو نەیباتەوەو چاودێری کەل‌وپەلی کا؛ یاخۆ زانست فێر بێ، تا لەم سۆنگەوە بژیوی ژینی دابین کا، یا خۆ بتوانێ ماڵ‌وسامان و زەوی و زاری چاودێری کا، یان لە لای خەڵک هێژا و بەڕێزتر بێ؛ یان

کۆڕی دەرس و ئامۆژگاری بگێڕێ تا لە بێدەنگی و تەنیایی بخەلسێ؛ یاخۆ کتێب بنووسێ تا بتوانێ جوانتر بنووسێ؛ یا بە پێ سەفەری حەج کات تا کرێی رێگای بۆ بمێنێتەوە؛ یان دەسنوێژ بشوا تا فێنک و پاکژ بێتەوە؛ یان خۆی بشوا تا بۆنی خۆش بێ؛ یان لە مزگەفتدا نیشتەجێ بێ تا کرێی خانووی لە ئەستۆ کەوێ؛ یا خێر بداتە پارسەک تا خۆی لێ دەرباز کا؛ یان خێر بداتە هەژار، چونکە پێی شوورەییەکە هیچی پێ نەدات؛ یان بڕواتە سەردانی نەخۆش تا ئەویش لە کاتی نەخۆشی ئەمدا سەردانی کا، یا بڕوا تا گلەیی لێ نەکەن، یان چاکەیەکی لەم جۆرە بکات تا ناوی بە چاکە ببرێ و ئەمەش مەراییە و حوکمی مەراییمان پێشتر گوتووە. هەموو ئەم بیرانە -کەم بن یا زۆر- دلبێشی و بێخەوشی دەفەوتێنن؛ چونکە بێخەوش ئەوەیە کە نەفس هیچ بەهرەیەکی لێ نەباو تەنیا لەبەر رەزا و ویستی پەروەردگار بێ و بەس. هەروەک لە پێغەمبەریان پرسی دلبێشی چییە، فەرمووی ئەوەیە کە بلێی: «رَبِّيَ اللهُ، ثمَّ تَستَقيمُ كَمَا أُمِرتَ»؛ واتە: بلێی پەروەرندەم ئەللایەو رێگەی راست بگریتە بەر، بەو جۆرەی کە دەستوور دراوە.

تا مرۆڤ لە دانستە ئینسانییەکانی دەرباز نەبێ، گەیشتن بەم ئاستەی بۆ دژوارە. بۆیە گوتوویانە هیچ شت دژوارترو ئەستەمتر لە دلبێشی نییە. گەر مرۆڤێک لە هەموو ژینیدا تەنیا هەنگاوێک بە دلبێشی هەلگرێ، هیوای رزگاری هەیە. لە راستیدا دەرهاوردنی کارێکی بێخەوش و پەتی لە نێو ئەم هەموو مەبەستە ئینسانییانەدا، وەکوو هەلێنجانی شیرە لە نێو خوێن و سەنێری ولساتدا؛ هەروەک فەرمووی: مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٖ وَدَمٖ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ[1]. دەرمانی ئەمەش ئەوەیە کە سەرەتا خۆی لە دونیا دابڕێ و دۆستایەتی پەروەردگاری بە سەردا زاڵ بێ و ببێتە وەکوو گراوێ کە هەموو تشتی لەبەر خودا دەوێ. ئەم کەسە گەر خواردنێ بخوا و پاشان بڕواتە ئاودەست، ئاودەست چوونەکەشی دلبێشییە، کەچی ئەوەی هۆگری دونیا بێ، بە ئاستەم بتوانێ نوێژ و رۆژوەکەشی بێخەوش بێ، چونکە هەموو کردەوەکانی مرۆڤ بە گوێرەی دڵیەو روویان لەو شوێنەیە کە دڵ رووی لێیە؛ هەرکەس هۆگری شانوشکۆیە، نووکوبەدی کارەکانی بۆ خەلکییە، تەنانەت بەیانی کە رووی دەشواو جلک دەکاتەبەر، هەمووی بۆ خەلکە. هەروەها دلبێشی لە هیچ شتدا وەکوو ئەوە دژوار نییە کە لە کۆڕی دەرس و مۆچیاری خەلکدا حەدیس بگێڕیەوەو رووت لە خەلکی بێ؛ چونکە زۆربەی مەبەست پەسندی خەلکە تا پەسندی خوا. زۆربەی زانایان خۆیان دانی پێدا دەنێن کە لەم کاتانەدا ناتوانن تەنیا بیریان لە لای خودا بێ، ئەوانەی کە خۆیان بە بێخەوش دەزانن، گێل و نەزان و ساویلکەن و خۆیان هەلفریواندووە. یەکێک لە گەورەکان دەلێ سی ساڵ لە ریزی پێشەوە نوێژم دەکرد،

---

[1] ـ (قورئان، ٦٦/١٦) لە نێوانی ریخ و خوێن را، شیرێکی پاک و رەوانوو دەرخوارد ئەدەین، بۆ ئەوانەی وەخۆرەوەن گوارایە. (هـ)

هەموویم بە قەزا گێڕاوە، چونکە جارێک دێر هاتم، زۆر شەرمەزار بووم، پێم وابوو خەڵکی دەڵێن دێر هاتووە، زانیم ئەم سی ساڵە لەبەر سەرنجی خەڵکی لە پێشەوە وەستاوم، نەک لەبەر رەزای خودا. کەواتە دلبێشی ئەوەیە کە تێگەیشتن و زانینی ئەستەمەوکردنی ئەستەمتر، هەروەها هەرچی ئامبازی تێدایەو بێخەوشە، لە لای خوا قبووڵ نییە.

**سەرنج**

بزانە، گەورەکان گوتوویانە دوو رەکات نوێژی زانایەک، هێژاترە لە نوێژی یەک ساڵەی نەزانێک. چونکە نەزان ئافەتەکانی عیبادەت نازانێ و تێکەڵاوبوونیان بە خەوش و نیازیتر نازانێ و بە بێخەوشی دەزانێ، چونکە خەوش و تێکەڵاوی لە عیبادەتدا وەکوو زەغەڵە لە زێڕدا، کە بەشێکی زێڕە و هەرکەس دەیبینێ بەزێڕی دەزانێ، تەنانەت سەڕافێنیش هەڵە دەکەن، مەگین سەڕافێکی شارەزاو کارزان؛ بەڵام نەزانان هەرچی وەکوو زێڕ بێ، بەزێڕی دەزانن، هەرچەند کە تەنیا رەنگی زێڕ بێ.

ئەو خەوشانەی کە دلبێشی عیبادەت دەفەوتێنن، چوار ئاستیان هەیە، هەندێکیان شراوەتر و بەرپێوارترن.

ئەمەی لە مەراییدا دادەنین تا ئاشکرا بێ:

**یەکەم**: ئەوەیە کە ئەو کاتەی کە نوێژ دەکا، خەڵکێ لەوێ تێپەڕن، شەیتان پێی بلێ جوانتر بیخوێنە تا لۆمەت نەکەن. ئەمەیان رواڵەتییە.

**ئاستی دووەم** ئەوەیە کە بیزانێ و خۆی لێ ببوێرێ، شەیتان پێی بلێ جوانتر بیخوێنە تا خەڵکی پێرەویت لێ کەن و پاداشی ئەوەت بەرکەوێ. رەنگە بەمە فریو بخواو نەزانێ کاتێ پاداشی پێشەوایی بەردەکەوێ کە تیشکی خۆبەکەمگری و پارێزکاری بەسەر دلی خەڵکدا بدا، بەڵام کە خۆی بە کەم نەگرت، کەچی کەسانیتر وابزانن خۆی بەکەم دەگرێ، ئەوان پاداشیان هەیە و ئەمیش لەبەر دوڕازی لیێ دەپرسنەوە.

**ئاستی سێیەم** ئەوەیە کە بزانێ کە گەر لە تەنیاییدا بە ئاوەژووی نێو خەڵکی عیبادەت کا، تووشی رووبینی هاتووە، بۆیە هان دەدا تا بەو چەشنەی لە نێو خەڵکدا نوێژ دەکا، لە تەنیاییشدا هەروابێ و بە جوانی و تەکووزی نوێژ بکا. ئەمە هەم مەراییە و هەمیش بەرپیوارترە. بەڵام ئەم کەسە دەگەڵ خۆی مەرایی دەکا؛ چونکە لە خۆی شەرم دەکا کە لە تەنیاییدا بە پێچەوانەی نێو خەڵکی نوێژ کا، هەروەها پێی وایە بەم چەشنە لە مەرایی خەلستووە، کەچی نازانێ کە لە تەنیاییشدا تووشیاری مەرایی هاتووە.

**ئاستی چوارم**، ئەمەیان بەرپیوارترە، چونکە بۆ ئەوەی کە نازانێ خۆبەکەمگری چ لە تەنیایی و چ لە

نێو خەڵکدا گەر لەبەر خودا نەبێ، بە کەڵک نایە. شەیتان پێی دەڵێ لە گەورەیی پەروەردگارت رامێنە و بزانە لە کوێدا راوەستاوی، تا بیر کاتەوەو خۆی بەکەم بگرێ و لە چاو خەڵکدا هێژا ببێ. گەر لە تەنیاییدا ئەم بیرەی بە مێشکدا تێنەپەڕێ، هۆی ئەمەی مەراییە، بەلام شەیتان لێی دەیشارێتەوە تا نەیزانێ. گەر تەنیا لە کاتێکدا کە خەڵک دەیبینن بیری گەورەیی خودای بە دڵدا دێ، ئەوە چ کەڵکێکی بۆی نییە، لە راستیدا دەبێ سەیرکردنی وڵسات[1] و خەڵکی لەلای وەک یەک بێ؛ گەر وا نەبوو، لە مەرایی پاک نەبۆتەوە و ئەوەی ئەم وردەکارییانە نەزانێ، بەردەوام خۆ ئازار دەدا و هیچ پاداشێکیشی بەرناکەوێ و رەنج بە خەسار دەبێ. واتای ئەم ئایەتەش هەر ئەوەیە: وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمۡ يَكُونُواْ يَحۡتَسِبُونَ.

**سەرنج:**

بزانە، کە مەبەست و نییەت، خەوشی تێکەوت و ئەم خەوشە بەهێزتر بوو لە نییەتی سەرەکی -عیبادەت بۆ خودا- دەبێتە هۆی ئازار و سزا؛ گەر وەکوو یەک بوون، واتە بەرانبەر بوون، نە پاداشی بەردەکەوێ و نە سزا دەدرێ؛ گەر لاوازتر بوو، ئەو عیبادەتە بێ پاداش نابێ. هەروەها هەرچەند لە ئەخباردا هاتووە کە ئەوەی لە عیبادەتدا ئامباز بۆ خودا دادەنێ، پێی دەڵێن بڕۆ پاداشت لەوە بستێنە کە عیبادەتت بۆ کردووە، بەلام بەڕای من مەبەست لەم خەبەرە ئەوەیە کە هەردوو مەبەست بەرانبەر بن؛ بۆیە هیچ مزی پێنادرێ و دەڵێن لەوەی بیگرە کە عیبادەتت بۆ کردووە. لەوەدا کە خەبەر دەڵێ سزا هەیە، مەبەست ئەوەیە کە دۆزی عیبادەت خەڵک بووبێ نەک خوا، ئەمەش مەراییە و سزای هەیە. بەلام گەر دۆزی سەرەکی عیبادەت و نزیک کەوتنەوە بە خودا بووبێ و ئەویتر لاواز بێ، نابێ بێ پاداش بێ، هەرچەند ئەو پاداشە وەکوو پاداشی ئەو کەسەی کە بێخەوشە نابێ. بۆ ئەم پەیڤە دوو هۆمان هەیە:

**یەکەم** ئەوەیەکە پێشتر سەلماندمان کە واتای سزادان دووری دڵە لە هێژایی و گەورەیی پەروەردگار، ئەوەش هۆی ئەو شتەیە کە بە ئاوری دووری دەسووتێ و هەروەها نییەتی نزیکی بە خودا تووی بەختەوەرییەو تەمای مەرایی تووی چارەڕەشییە. پەرسڤدانەوەی ئەم دوو مەبەستە، یارمەتی دانیانە. یەکیان لە خودای دوور دەکاتەوەو یەکیان نزیکی دەکاتەوە. کە بەرانبەر بوون، یەکیان بە قەدەر دەستێ نزیکی دەکاتەوەو یەکیان بە قەدەر دەستێ دووری دەکاتەوە، بۆیە دێتەوە

---

١- وڵسات: ئاژەڵ، مالات.

٢ ـ (قورئان، ٤٧/٣٩) ئەوسا شتێکی وەهایان لە خوداوە بۆ دێتە بەرچاو کە هەرگیز بە بیریشیاندا نەهاتووە. (هـ)

شوێنی پێشووی خۆی و هیچ زیاد ناکا. گەر بە قەدەر نیو دەست لێی نزیک ببێتەوە، ئەوە تووشی زیان و دووری هاتووەو گەر بە قەدەر نیو دەست لێی دوور بێتەوە، نزیک کەوتۆتەوە. وەکوو نەخۆشێک کە گەر شتی گەرم بخواو بە هەمان ئەندازەش شتی سارد بخوا، بەرانبەرەو وەکی‌یەکن؛ گەر کەمتر ساردی بخوا، گەرمەکە زاڵتر دەبێ و گەر زۆرتر ساردی بخوا، ساردەکە زاڵتر دەبێ. کاریگەری عیبادەت و گوناح بەسەر رۆناهی و تاریکی دڵدا، وەکوو کاریگەری دەرمانەکانە بەسەر مەزاجی لەشدا. تۆزکاڵێکی لێ نافەوتێ و هەمووی بە کێشانەی داد، دەپێورێ و گرانی و سووکی هەر یەکیان دیاری دەگری؛ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ[1]» باس لەوە دەکا. بەلام چاتر وایە زۆرتر ئاگەدار بێ، چونکە رەنگە خەوشەکەی زۆرتر و بەهێزتر بێ و ئەم بە لاواز و بێوزەی بزانێ، بۆیە باشتر ئەوەیە بۆ پاراستنی خۆی، رێگەی مەبەستی نارەوا دابخرێ.

**دووەم**، رای زۆربەی زانایان ئەوەیە کە گەر کەسێک لە رێی حەجدا مامەڵە بکا، حەجەکەی نافەوتێ؛ هەرچەند وەکوو ئەو کەسەی کە بە دڵبێشی و بێخەوشانە بۆ حەج دەڕوا و پاداشی پێ نادرێ، بەلام چونکە مەبەستی سەرەکی زیارەتی ماڵی خودایە و مامەڵە و بازرگانی پاشەرۆکی ئەم سەفەرەیە، سەرلەبەری پاداشەکەی نافەوتێ؛ هەرچەند کەم دەبێتەوە. هەروەها ئەوەی دەیەوێ لە رێی خودا خەزا بکاو دوو تاقم هەبن کە دەگەڵیان بە شەڕ بێ، یەکیان دەوڵەمەند و یەکیان هەژار. لەوەی دەوڵەمەندە دەسکەوتی زۆری دەس دەکەوێ و لە هەژارەکە هیچی بەرناکەوێ، بۆیە خەزا دەگەڵ دەوڵەمەندانی پێ باشتر و بە قازانجترە؛ بۆ ئەم کەسەش نابێ پاداشەکەی بە تەواوی بفەوتێ، چونکە مرۆڤ بۆی هەیە کە بیر لە دەسکەوتی شەڕکاتەوە. بەلام -العیاذ بالله- گەر مەبەستی لە خەزا تەنیا دەسکەوت بێ، بەرکەوتنی پاداش بۆی ئەستەمە، چونکە بەم نییەتەوە هیچ کردەوەیەکی راست نایێ؛ بە دانستە کۆڕی دەرس و ئامۆژگاری و کتێبنووسین و بە کورتی ئەو کارانەی روویان لە خەڵکە.

## پاژی سێیەم - راستی

بزانە، راستی لە دڵبێشی نزیکە و پلە و پاگەی زۆر مەزنە، هەرکەس بگاتە بەرزترین ئاستی پیێ دەڵێن «راسبێژ»؛ پەروەردگار لە قورئاندا پەسنی کردووە و دەڵێ: رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ[2] هەروەها گوتی: لِيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ[3]. لە پێغەمبەریان پرسیار کرد: «کاملبوون لە

1 ـ (قورئان، ٧/٩٩) سا هەر کەسیش بە سەنگایی مێرووڵەی هەرەوردیلە چاکەی هەبووبێ، دەیبینێ. (هـ)

2 ـ (قورئان، ٢٣/٣٣) پیاوی واهەن ئەو پەیمانەی بە خوایان دا، پێکیان هێنا. (هـ)

3 ـ (قورئان، ٨/٣٣) تا لە راستان سەبارەت بە راستیەکەیان پرسیار بکا. (هـ)

چیدایە؟» فەرمووی: «زمانی ڕاست و ئاکاری بێ‌گرێ‌وگۆڵ». کەواتە گەیشتن لە واتای ڕاستی گرینگەو ئەم ڕاستیەش لە شەش شتایە، هەرکەس لەوانەدا تەواو بێ، پێی دەڵێن ڕاسبێژ.

**ڕاستی یەکەم** لە زارایە، لە هەواڵێکدا کە دەیگێڕێتەوە، هیچ درۆ نەڵێ و بەڵێنی درۆنەدا؛ پێشتر گوتمان کە نەخشی زمان دەنیشێتە سەردڵ و پەیڤی لار و وێر، دڵیش لاردەکاو گوتەی ڕاستیش، دڵ ڕاست دەکا. تەواوتر بوونی ئەمەش بە دوو شتەوە بەندیوارە:

**یەکەم** ئەوەیە کە پلاریش نەگرێ، واتە ڕاست بڵێ و گوێکر شتێکی‌تری لێ فام کا. بەلام برێ شوێن هەیە کە ڕاست گوتن دەبێتە هۆی ئاژاوە تێیدا، وەکوو لە شەڕدا، لە نێوان ژن و پیاودا، لە ئاشتدانەوەی خەڵکیدا؛ بۆ ئەمانە ئیزنی درۆ دراوە؛ بەلام چاتر وایە تا دەتوانێ بە تیز و پلار مەبەست بگەینێ و لە درۆی ئاشکرا خۆی ببوێرێ. هەروەها گەر کەسێک لە دۆز و مەبەستدا ڕاست و بێ‌گرێ بێ و لەبەر ڕەزای خودا و چاکەی خەڵکی درۆ بکا، لە ریزی ڕاسبێژان نایەتەدەر.

**دووەم** ئەوەیەکە لە ئاخافتن دەگەڵ پەروەردگاردا ڕاست و بێ درۆ بێ. بۆ وێنە، گەر بڵێ «وجهت وجهی» و کەچی رووی دڵی لە دونیا بێ، درۆی داوەو رووی لە پەروەرندەی نەبووە. هەروەها کە بڵێ «إيّاکَ نَعْبُد»، واتە بەندەی تۆین و هەر تۆ دەپەرستین، کەچی لە ڕاستیدا لە ژێر رکێفی دونیاو شاوەتەکانیدایە و بۆتە کۆیلە و بەندەی دونیا، ئەمەش هەر درۆی داوە؛ چونکە بەندەی شاوەتەکانیە نەک پەروەرندەی. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «تَعسَ عَبدُ الدِّرهَمِ وَالدِّينار[1]». بە بەندەی زێڕ و زیوی ناوبردووە. تەنانەت مرۆڤ تا لە هەموو دنیا دەرباز نەبێ، نابێتە بەندەی خوا. تەواوتربوونی ئەم رزگاریە، ئەوەیە کە لە خۆیشی بخەلسێ، هەر بەو چەشنەی لە خەڵک خەلستووە، تا ئەوەی کە هیچ ویست و ئیرادەی لە خۆ نەمێنێ؛ بێجگە لە خودا هیچی نەوێ و ئەوەش کە بەسەریدا دەیهێنێ، پێی شادوشوکر بێ. ئەمە ڕاسبێژییەکی تەواوە لە بەندەگیدا. گەر کەسێک وا نەبێ نە ڕاستە و نەڕاسبێژ.

**ڕاستی دووەم** لە نییەتدایە، لە هەر کاردا بێجگە لە خودای مەبەست نڤبێ و شتی‌تری نەداتە پاڵ. ئەمە هەمان دلبێشیيە و دلبێشی، ڕاسبێژیشی پێ دەڵێن، چونکە هەرکەس لە دڵیدا بیرێک بێجگە لە نزیکی بە خودا بێ، لە عیبادەتیدا درۆزنە.

**ڕاستی سێیەم** لەویستدایە. وەکوو ئەوەی کەسێک بیرکاتەوە کە گەر بەسەر وڵاتێکدا ببێتە سەرۆک، دادوەرانە حوکم بکا، یان گەر سامانێکی پێ بدەن، هەمووی بە خێر و سەدەقە بدات،

---

[1] ـ فەوتاوە بەندەی زێڕ و زیو.

هەروەها گەر کەسێک بێ و بۆ سەرۆکایەتی و وانەگوتنەوە لەو هێژاتر بێ، جێگای خۆی بۆ چۆڵ دەکا. ئەم ویستە برێ جار بە خوست و هێزەو هەندێ جاریش لاواز و بە گومانە. ئەو بەهێزەی بێگومانە، بە راستی لەویستدا ناو دەبەن؛ هەروەک دەڵێن: ئەم شاوەتە درۆیە، واتە هیچ بنەمایەکی نییە، یان راستە، واتە بەهێزە. راسبێژ ئەوەیە کە هەردەم بیری چاکەی لە دڵدا بەهێز بێ و لە گەشەدا بێ. هەروەک عومەر گوتی: «گەر بمبەن و سەرم ببرن، پێم خۆشترە لەوەی کە ببمە سەرۆکی هۆزێ کە ئەبووبەکریان لە ناوایە». کەسی واش هەیە کە گەر بلێن پێت خۆشە سەری تۆ ببرن‌یان سەری ئەبووبەکر، دەڵێ سەری ئەبووبەکر ببرن. جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئەو کەسەی کە ژینی خۆی لە ژینی ئەبووبەکر خۆشتر دەوێ و ئەو کەسەی کە سەرۆکایەتی ئەبووبەکر لە ژینی خۆی گرینگتر دەزانێ.

**راستی چوارەم** لە پێکهێنانی ویست و بڕیارەکانیانە. کەسی وا هەیە ئەم بڕیارە لە خۆیدا بەهێز دەکا کە لە شەڕدا گیانم بەخت دەکەم، یان کە کەسێکی هێژاتر هات دەسەلاتەکەی پێ دەبەخشم، بەلام کە هەلی ئەو بڕیارەی بۆ دەرەخسێ، نەفس ئیزنی پێ نادا و سەری بۆ نەوی ناکا، بۆ ئەم واتایە خودا گوتی: رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَـٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِ واتە بەڵێنەکانیان پێک هێناو گیانیان بەخت کرد؛ بۆ ئەوانەش کە گوتیان ماڵوسامانمان دەبەخشین و کەچی گفتی خۆیان پێک نەهێنا، گوتی: وَمِنۡهُم مَّنۡ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنۡ ءَاتَىٰنَا مِن فَضۡلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ۝ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضۡلِهِۦ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ[1] تا ئەو جێگای کە گوتی: بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ، بە درۆزن ناوی بردن کە گفت و بەڵێنیان پێک نەهێنا.

**پێنجەمین راستی** ئەوەیە کە کارێکی لێ نەوەشێتەوە کە بە دڵ مەیلی پێ نەبێ. بۆ وێنە گەر کەسێک بە هێوری و بەکاوەخۆ رێگا ببڕێ، کەچی لە دڵدا ئەو هێمنییەی نەبێ، راسبێژ نییە. ئەم راستبوونەش بە یەکگرتن و راستبوونی ئەوەی لە دلایەو ئەوەی ئاشکرایە پێک دێ؛ ئەمەش بۆ کەسێک بووزدەخوا کە دڵی و نهێنیەکانی دەروونی بەرزتر و جوانتر بن لەوانەی ئاشکرایە، یاخۆ لانی

---

١ـ (قورئان، ٩/٧٥، ٧٦، ٧٧) هێندێک لە نێو ئەوانەدا پەیمانیان دەگەڵ خودا بەست کە شەرتە ئەگەر خودا لە چاکەی خۆی بەشمان بدات، ئێمەش خێر و خێرات دەکەین و دەچینە ریزی پیاوچاکانەوە. کە خوا کردی و لە چاکەی خۆی زێدەی دانێ، رژدایەتیان لەسەر کرد و دیسان پشتیان هەلکرد و روویان وەرگێڕا. چونکە ئەوان پەیمانی خوایان شکاند و درۆیان لە یەل خوا کرد، دوڕوویی هەر لە دڵیاندا هێشتوتەوە، تا ئەو رۆژەی دێنە بەر بارەگای خودا. (هـ)

کەم ئاشکرا و بەرپیواری وەکوو یەک بن. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەرندەم! نهێنیەکانم باشتر لە ئاشکراکانم بن، ئاشکراکانیشم جوان و بەدەو کە». ئەوەی بەم چەشنە نەبوو و ویستی بە هۆی هەڵس و کەوتیەوە دەروونی بە چاکە بنوێنێ، درۆی گوتووە و لە راستی کلابووە، هەر چەند مەبەستی مەرایی نەبووبێ.

**شەشەمین راستی** ئەوەیەکە لە مەقامانی دیندا، پەیدۆزی راستەقینە بێ و چاوی بە تەنیا لە رواڵەتی دین نەبێ؛ وەکوو پارێزکاری و خۆشەویستی و پشتبەستن و ترس و هیوا و رەزا و تاسە، چونکە هیچ برواداریک بە تەواوی لەمانە بێبەش نییەو لە هەریەکیان نەختێکی هەیە. ئەوەی لەمانەدا بە خوست بێ، راسبیژە. هەروەک فەرمووی: إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ[1]. کەواتە ئەوەی کە بروایەکی تەواوی هەیە، پیێ دەڵێ «راسبیژ». ئەمە وەکوو ئەو کەسەیە کە دەڵێن لە شتێک دەترسێ، نیشانەی ترسەکەی ئەوەیە کە دەلەرزێ و رووی زەرد هەڵدەگەرێ و نە ئاو و نەنانی پێ دەخورێ و ئوقرە ناگرێ. گەر کەسێک بەم جۆرە لە خودا بترسێ، دەڵێن ئەمە ترسی راستە. بەڵام گەر کەسێک بڵێ بەم چەشنە لە خوا دەترسم، کەچی واز لە گوناح ناهێنێ، پێی دەڵێن ترسی درۆینە. لە هەموو مەقاماتدا بەم چەشنە جیاوازی هەیە.

کەواتە هەرکەس لەم شەش واتادا راست بێ و تەواو بێ، پیێ دەڵێن تەواو راسبیژ. بەڵام ئەوەی لە هەموویاندا کامڵ نەبێ، تەواو راستی پێ ناڵێن، بەڵکوو رادەی راستیەکەی بەقەدەر راستبوون لە هەر کامیانە.

---

١ ـ قورئان (١٥/٤٩) خاوەن باوەر ئەو کەسانەن کە بروایان بە خوا و پێغەمبەری هەیە و تووشی دوودڵی نەبوون و بەگیان و ماڵ لە رێی خودا تێکۆشاون و هەر ئەمانە بەراستیانە. (هـ)

## بنەمای شەشەم - چاودێری و بە خۆڕاگەیشتن

بزانە کە پەروەردگار دەڵێ ڕۆژی پەسڵان کێشانەکان رادەنین و لەکەس ستەم ناکەین و هەرکەس بە سەنگایی تۆی وردیلەی دانە خەردەلیش چاکە، یان خراپەی کردبێ لە تای ئەو کێشانەدا رایدەنین و بۆی حسیبێ دەکەین و بە گوێرەی ئەوە پەرسڤی دەدەینەوەو هەر ئێمە بۆ ئەم کارەی بەستین: وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا[1]. کەواتە، چونکە ئەم بەڵێنەیداوە، بە خەڵکی راسپاردووە تا لەم دونیادا بە کاری خۆیان رابگەن و حسێبگەری خۆیان بن و گوتی: وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ[2]. لە خەبەردا هاتووە کە «ژیر و زانا ئەوەیە کە هەر ڕۆژی بکاتە چوار بەش: بەشێکیان بە خۆی رابگاو حسێبی دوارۆژی خۆی بکا، بەشێکی بۆ دوعا و نزا و سکاڵا لەگەڵ پەروەردگاری تەرخان کا، بەشێکی بژیوی ژینی دابین کاو کەرتێکیشی لە حەلالەکانی دونیا بۆ حەسانەوە چێژ وەربگرێ». عومەر گوتی: «حَاسِبُوا أنفُسَكُم قَبل أن تُحاسَبُوا»؛ واتە: بەر لەوەی بە حسێبتان رابگەن، حسێبگەری خۆتان بن. پەروەردگاریش فەرمووی: «ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! پشوودرێژ بن و ئاگاداری نەفس و ئارەزووەکانی بن، هەروەها لەم خەباتەدا پتەو و خۆڕاگربن[3]. بۆیە گەورەکانی دین و تێگەیشتووان زانیان کە بۆ بازرگانی هاتوونەتە ئەم دونیاوە و مامەڵەیان دەگەڵ نەفسە و سوود و زیانی ئەم مامەڵەیە، بەهەشت و جەهەننەم یاخۆ بەختەوەری و کۆڵەواری هەتاهەتاییە. کەواتە نەفسیان وەکوو ئامبازی خۆ داناو سەرەتا -وەکوو باوە- مەرجەکانی خۆیان بەو ئامبازە گوت و پاشان چاودێرییان لێکرد و دواتر پێی ڕاگەیشتن و گەر خەیانەتی کرد با، لۆمەو سەرزەنشیان دەکرد و سزایان دەدا. ئەمانیش دەگەڵ نەفسیان لەسەر ئەم شەش مەقامە

---

١ ـ (قورئان، ٤٧/٢١) ڕۆژی قیامەت چەندین تەرازووی بەرانبەر وەکار دەخەین و ئەوسا ناهەقی لەکەس ناکرێ.

٢ ـ (قورئان، ١٨/٥٩) با هەر کەسێ بێنێتەوە بەرچاوی خۆی، بۆ سبەینێ چەن وە پێشە خۆی خستوەو ترستان لە خودا هەبێ. خـودا لە هەر کارا دەیکەن ئاگادارە. (هـ)

٣ - قورئان، ٣/٢٠٠.

وەستان: «مەرج دانان، چاودێری، پێڕاگەیشتن، سزادان، تێکۆشان و لۆمە و سەرکۆنە».

**مەقامی یەکەم - مەرج دانان**

بزانە، هەر وەکوو چۆن ئامبازێ کە ماڵوسامانی خۆتی پێدەدەی تا بازرگانی پێوە بکا، بە بۆنەی قازانجەوە یار و شەریکتە، بەڵام چونکە ڕەنگە تەمای ماڵوسامان بەرەو خەیانەت پاڵی پێوە بنی و دنەی بدا، سەرەتا مەرجی بۆ دادەنی و پەیمانی دەگەڵ دەبەستی و پاشان بە سەریدا چاودێری دەکەی و ئاگات لێیە و لەسەر خێر و قازانج دەگەڵی چەقە دەکەی، نەفسیش هەر ئاوەهایە و تەنانەت لە پێشتریشە؛ چونکە قازانج و خەساری مامەڵە لەگەڵ نەفس هەتاهەتاییە، بەڵام هی دونیا تەنیا دوو ڕۆژەو هەرای ئەبڕێتەو. ئەوەش کە هەتایی بێ لە لای مرۆڤی ژیر و خاوەن بیر بە نرختر و هێژاترە، تەنانەت دەڵێن شەڕێک کە بمێنێتەوە چاترە لە خێرێکی کەم تەمەن. هەروەها چونکە هەر هەناسەیەکی مرۆ، گەوهەرێکی بە نرخە کە گەنجێک پێک دێنێ، چاودێری و ئاگەداری لێی گرینگترە.

ژیر و خاوەن ویر ئەو کەسەیە کە هەر ڕۆژ، پاش نوێژی بەیانی، ماوەیەک دڵی خۆی ئاسوودە کاو بە نەفسی خۆی بڵێ: «من هیچ سامانێکم نییە، تەمەنم نەبێ، هەر هەناسەیەک کە ڕۆیشت، قەد ناگەڕێتەوە، چونکە هەناسەکانم، خودا ئیزن نادا لەوەی ڕەچاو کراوە زۆرتر بن؛ کە تەمەن ڕابورد، ناگەڕێنەوە؛ ئێستا کە درەنگە، ماوەی کۆوەکردنی توێشووی دواڕۆژە، بەیانی لە پەسلاندا کە هەلم هەیە، توێشووم پێ کۆوە ناکرێ. ئەمڕۆ، ڕۆژی تۆیە کە پەروەرندەت تەمەنی پێداوی، کە لە پرونەکاو پێمێرد بێتە سەرت و گیانت بستێنێ، بە ئارەزووی ئەوە دەبی کە یەک ڕۆژ مۆڵەتت بدەن تا قەرەوی هەڵەکانت کەیتەوە، ئێستا کە ئەم هەلەت پێدراوە، ئەی نەفسی کلۆل! ئامانە نەکەی بە تاوێ خۆ بفرۆشی و سەرمایەکەت بە خەسار بدەی؛ چونکە ڕەنگە سبەینێ ماوەت نەبێ و بێجگە هەناسەی سارد چیترت بۆ نەمێنێتەوە. ئەمڕۆ پێت وابێ کە مردوویت و تکات کردووە هەلت بدەنێ و ئەو هەلەیان پێداوی و دەبێ کاری خۆت پێک بێنی و ڕابردووت قەرەوی کەیتەوە. جا چ زیانێ خراپتر لەوەیە کە کاتی خۆت بفەوتێنی و بەختەوەری خۆتی لێ پێک نەهێنی».

لە خەبەردا هاتووە کە: «لە پەسلاندا شەو و ڕۆژ کە بیست و چوار کاتژمێرە لە بیست و چوار سندۆقدا لە پێش بەندە ڕایدەنێن. یەکەمیان ئاوەڵا دەکەن، تەژی لە ڕووناکی ئەو چاکانەیە کە ئەنجامی داوە، ئەوەندە بەو ڕووناکاییە شادومان دەبێ و دڵی هێور دەبێ، کە گەر ئەو شادییە بەسەر دڵی خەڵکی جەهەننەمدا دابەش کەن، ئازاری دۆژەلە بیر دەکەن، هۆی ئەم شادییەش ئەوەیە کە دەزانێ لەم سۆنگەوە لە لای خودا قبوول دەبێ. سندۆقێکیتر ئاوەڵا دەکەن، ڕەش و تاریک و

بۆگەن، بە چەشنێ کە هەموو خەڵکی دوارۆژ دەست بە بینیانەوە دەگرن. ئەوەش ئەو کاتەیە کە خەریکی هەڵەو پەڵە و گوناح بووە. ئەوەندە ترس و شەرمەزاری و ئاژاوە دەکەوێتە دڵی کە گەر بەسەر هەموو خەڵکی بەهەشتدا ببیەشنەوە، کەیف و خۆشی بەهەشتیان لێ تێک دەدا. یەکێکی-تریان دەکەنەوە، نە تاریکە و نەڕوون. ئەوەش ئەو دەمەیەکە بە خۆڕایی بە فێڕۆی داوە، ئەوەندە هەناسەسارد و پەژیوان دەبێ وەکوو ئەو کەسەی بەسەر وڵات و سامانێکی لەڕادە بەدەر دەسەڵاتی هەبووبێ و کەچی هەمووی بەفێڕۆ دابێ و فەوتاندبێتی. یەک‌بەیەکی کاتەکانی تەمەنی هەر بەو چەشنە لە پێشی رادەنێن». بۆیە بە نەفسی خۆی دەڵێ[1]: «ئەی نەفس! بەم جۆرە بیست و چوار خەزانەیان پێت پیشان دا، ئامانە نەکەی هەڵەکانت بفەوتێنی، تۆ قەد توانی ئەو هەناسە ساردییەت نییە». گەورەکان دەڵێن: «بگرە لە هەڵەکانت خۆش بن و بتبوورن، مەگین ئاست و پلەی چاکانت لە دەست ناچێ و تۆش هەناسەسارد و پەژیوان نامێنیتەوە». کەواتە دەبێ هەموو ئەنامی خۆتی پێ بسپێری[2] و بڵێی: «ئامان! ئاگاداری چاو و زمان و حەوت ئەنامت بە».

چونکە گوتوویانە: «دۆژەحەوت دەرگای هەیە». دەرگاکانی ئەم ئەندامەی تۆن، کە هەرکامیان بە تەنیا خۆی دەتوانێ بتباتە نێو جەهەننەمەوە. کەواتە، بیریان لێ کەوەو بزانە هەر یەکەیان چ هەڵەیەکی لێ دەوەشێتەوە، ئاگەداری کەوەو لە راستەڕێی راگرە و لەسەر ئەو چاکەو عیبادەتانەی کە لێی دەوەشێتەوە، دنەی بدەو هانی بدە تا سوورتر بێ: بڕیار بدە و نەفست لە هێڵی لار بترسێنە کە ئازار دەدرێ، چونکە نەفس هەرچەند سەربزێو و سەرکەشە، بەڵام ئامۆژگاری قبووڵ دەکا و کۆشەوە بە سەریدا کاریگەر دەبێ.

ئەمانە هەمووی چاودێری بەر لە کارە، هەروەک پەروەردگار فەرمووی: وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُۚ[3] پێغەمبەر فەرمووی: «زیرەک و ژیر ئەو کەسەیە کە بە کاری خۆیدا رابگاو کارێ بکا کە دوارۆژ بۆی بە کەڵک بێ».

پێغەمبەر فەرمووی: «هەر کار کە بۆت دێتە گۆڕێ، چاک سەیری کە، گەر ئەوە رێگای راستە، ئەنجامی بدە و گەریش لارێیە خۆتی لێ ببوێرە». کەواتە، هەموو بەیانیەک نەفس پێویستی بەم پەندانەیە و دەبێ ئەم مەرجانەی بۆ روون کەیتەوە مەگین ئەو کەسەی لەسەر کاری خۆی راست راوەستابێ، ئەو کاتەش چونکە هەر رۆژ کارێکی نوێی بۆ دێتە کایەوە، بەم مەرجانە پیۆیستی هەیە.

---

١ ـ پاش نوێژی بەیانی و دوای ئەم بیرانە، بە نەفسی خۆی دەڵێ.

٢ ـ بە نەفسی بسپێری.

٣ ـ (قورئان، ٢/٢٣٥) دەبێ ئەوەندەش بزانن خودا دەزانێ ئێوە چیتان لە دڵدایە، لێی بترسن. (هـ)

**مەقامی دووەم - چاودێری**

چاودێری بە مانەی پاسەوانی و ئاگادارییە، وەکوو چۆن کاتێ سامانەکەت بە ئامبازت سپارد و مەرجەکانت بۆ روون کردەوە و پاشان دەبێ بەسەر کاریدا چاودێری کەی، نەفسیش ئاوەهایە، چونکە گەر ئاگەداری نەبی، بە پێی ویستی خۆی دەبزوێتەوە و دەداتەپەی شاوەت و سستی. بنەمای چاودێری لەسەر ئەمەیە کە بزانێ پەروەردگاری مەزن لە هەرچی بە بیریدا تێدەپەڕێ، یان کارێک لێی بوەشتێتەوە، ئاگادارە. خەلک روالەتی دەبینن، کەچی خودا هەم روالەتو هەمیش دەروونی دەبینێ. هەرکەس ئەمەی زانی و ئەم خۆشەویستیەی بەسەر دلدا زاڵ بوو، روالەت و دەروونی بەرێز و حورمەت دەبێ. چونکە گەر بەمە بڕوای نەبێ، کافرەو گەر بیبێ و کەچی بە ئاوەژووی بجوێتەوە، سەربزێوییەکی گەورەی کردووە. پەروەرندەی مەزن دەلێ: أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ[1]؛ واتە: مەگین نازانی خودا دەتبینێ؟

حەبەشییەک بە پێغەمبەری گۆت: گوناحی زۆرم هەیە، بۆم هەیە تەوبەکەم؟ فەرمووی: بەلێ، بۆت هەیە. گوتی: کاتێ خەریکی گوناح بووم، خودا چاوی لێم بوو؟ فەرمووی: ئەری دەتیدی. گوتی: ئاخ! نەعرەیەکی کێشاو مرد.

پێغەمبەر گوتی: «وا خودا بپەرستە کە دەلێی دەیبینی، گەر پێت ناکرێ دلنیا بە ئەو تۆ دەبینێ». گەر وا بیر نەکەیتەوە کە خودا لە هەموو کاتدا چاوی لێتە، ئەم کارەت بۆ پێک نایە. هەروەک فەرمووی: إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا[2]؛ تەواوتریشی ئەوەیەکە وابیر کەیتەوە کە هەمیشە دەیبینی و سەیری دەکەی.

یەکێک لە پیران موریدێکی بو، پتر لە وانیتری خۆش دەویست. موریدەکانیتر ئێرەییان پێ برد. پیرەکە بە هەریەکیان مەلێکی داو گوتی لە شوێنێکدا کە کەس نەتانبینێ بیکوژن. هەموویان رۆیشتن، کوشتیان و گەڕانەوە، بێجگە ئەو موریدە کە مەلەکەی زیندوو هێناوە. گوتی: «بۆچیت نەکۆشت؟» گوتی: «هیچ کوێم نەدیتەوە کە پەروەردگارم لەوێ نەبێ». بەم چەشنە ئاستی ئەم موریدەی بەوانیتر پیشاندا، چونکە ئەم هەمیشە خۆی لەبەر چاوی خوادا دەبینێ و ئاوڕ لە کەسیتر ناداتەوە.

کاتێ زلێخا یووسفی گاس کردە لای خۆی، هەستاو رووی ئەو بتەی کە بە خودای خۆی دەیزانی، داپۆشی. یووسف گوتی: «تۆ لەو بەردە شەرم دەکەی، من لە ئافرینەری حەوت ئاسمان و زەوی کە

---

١ ـ قورئان، ١٤/٩٦.

٢ ـ (قورئان، ١/٤) خوا هەمیشە چاودێرە بە سەرتانەوە. (هـ)

هەم دەبینێ و هەمیش دەبیسێ چلۆن شەرم نەکەم؟»

یەکێک بە جونەیدی گوت: «ناتوانم بەر بە چاوی خۆم بگرم، دەبێ چ بکەم؟» گوتی: «بزانە کە پەروەردگاری مەزن پتر لەوەی تۆسەیر دەکەی، سەیرت دەکا».

لە خەبەردا هاتووە کە پەروەردگار فەرمووی: «بەهەشتی عەدن بۆ کەسانێکە کە کاتێ تەمای گوناحیان هەیە و گەورەیی منیان دەکەوێتەوە بیر، رادەوەستن و لەبەر شەرمان پاشگەز دەبنەوە».

عەبدوڵلای کوڕی دینار گوتی: لەگەڵ عومەری خەتتابدا لە ڕێی مەککەدا بووین، لە شوێنێکدا بۆ پشوودان لامان دا. خولامێک کە شوانی مەڕ بوو، لە کێوێکەوە هاتەخوار. عومەر گوتی: «مەڕێکم پێ بفرۆشە». گوتی: «من بەندەم و ئەمەش هی من نییە». گوتی: «بە خودانی بڵێ گورگ بردوویە، چۆن دەزانێ؟». گوتی: «گەر خودانی ئەم مەڕە نەزانێ، خۆ خودای خۆم پێێ دەزانێ». عومەر گریا و گوتی خاوەنەکەتم بۆ گاس کە. بەندەکەی کڕی و رزگاری کرد و پێی گۆت: «ئەم پەیڤەت تۆی لەم جیهانەدا رزگار کرد و منی لەو جیهانیتر دەرباز کرد».

**سەرنج:** بزانە کە چاودێری دوو چەشنە:

**یەکەم چاودێری هەرەڕاستانە** کە دڵیان نوقمی گەورەیی پەروەردگارە و لەبەر گەورەیی شانوشکۆی خودا گەردن کەچن و بێجگە لە ئەو بیر لە چیدی ناکەنەوە. ئەم چاودێرییە کورتە. چونکە دڵ قایم و پتەوە و ئەندامانیتر پاشکۆی سەرۆکی دڵن و لە ڕەواکان خۆ دەبوێرن، چجای گوناح و ناڕەوا؛ ئەم کەسە پێویستی بە بیر کردنەوە و فڕوفێڵ نییە تا نەفسی لە ژێر رکێفدا بگرێ. ئەمە ئەو کەسەیە کە پێغەمبەر فەرمووی: «مَن أَصبَحَ وَ هُمُومُهُ هَمّاً واحِداً كَفاهُ اللهُ هُمُومَ الدُّنيا وَالآخِرَة»؛ واتە: هەرکەس بەیانی لەسەر یەک هیممەتەوە رابێ، پەروەردگار هەموو کارەکانی بۆ پێک دێنێ. کەسی وا هەیە لەم تاقمە کە بە چەشنێ نوقمی گەورەیی خودا دەبێ گەر لەگەڵی قسە بکەی تێناگاو هەرچەن چاوی کراوەیە، گەر لەبەر چاوی رابووری ناتبینێ. بە عەبدولواحدی کوڕی زەیدیان گوت: «کەسی وا دەناسی کە بە چەشنێ نوقمی گەورەیی خودابێ کە ئاگای لە خەڵکوخوا ببڕێ؟» گوتی: «کەسێک دەناسم، هەنووکە دێتە ژوور». "عتبة الغلام" هاتە ژوور. گوتی: «لە ڕێدا کێت بینی؟» گوتی: «هیچ کەس». لە کاتێکدا ڕێگای لە دوڕی بازاڕەوە بوو.

یەحیای زەکەریا لە تەنشت ژنێکەوە تێپەڕا. دەستی پێوە ناو خستی. گوتیان: «بۆچی وات کرد؟» گوتی: «پێم وابوو کە دیوارە».

یەکێک گوتی: «لە شوێنێکەوە تێدەپەڕام، تاقمێکم بینی کە تیریان دەهاویشت، یەکێک دوورتر لەمان دانشتبوو. ویستم بیدوێنم، گوتی: "یادی خودای مەزن سەرتر لە ئاحافتنە". گوتم: "تەنیای؟"

گوتی: "نە، خودای مەزن و دوو فریشتەم لەگەڵایە". گوتم: "ئەمانە کامیان بردیانەوە؟" گوتی: "ئەوەی کە خودای بەخشی". گوتم: "ڕێگا لە کوێوە دەچێ؟" سەری بەرەو ئاسمان هەڵبڕی و هەستاو ڕۆیشت و گوتی: "پەروەرندەم! زۆربەی خەڵکی لێت بێئاگان"».

شبلی ڕۆیشتە لای ئەبولحەسەنی نووری. خەریکی بیرووبیر بوو، تەنانەت موویەکی نەدەبزووت. گوتی: «ئەم چاودێرییە بەم تەکووزی و لەبارییە لە کێ فێر بووی؟» گوتی: «لە پشیلە، دیم لەبەر کونە مشکێک مڵاسی گرتووە، بێجووڵەتر لەمە کە من وەستاوم».

ئەبووعەبدوڵڵای خەفیف دەڵێ: «شوێنێکیان پێ پیشان دام کە پیر و گەنجی بەردەوام خەریکی چاودێرین، ڕۆیشتمە لایان. دوو کەسم بینی کە ڕوو بە قیبلە دانشتبوون، سێ جار سڵاوم کرد، پەرسڤیان نەدامەوە گوتم: "تۆ بی و خودا وەرامی سڵاوم بدەنەوە". گەنجەکەیان سەری هەڵبڕی و گوتی: "کوڕی خەفیف! ئەم دونیا کورتەو لەم کورتەش نەختێ ماوە، لەم نەختە توێشووی زۆر بۆ خۆت هەڵگرە. کوڕی خەفیف! مەگەر زۆر بێکاری خەریکی سڵاو کردنی". ئەمەی گوت و سەری داخست. برسێتی و تینوێتی تەنگیان پێ هەڵچنیبووم. برسیەتی وتینوێتیم لە بیر نەماو خۆم پێیان ئەسپارد و لەگەڵیان بۆ نوێژ ڕاوەستام و نوێژی نیوەڕۆ و پاش نیوەڕۆم خوێند. گوتم: "ئامۆژگارییەکم کەن". گوتی: "ئەی کوڕی خەفیف! ئێمە کارەسات لێداوین، زمانی مۆچیاریمان نییە". تا سێ ڕۆژان لەوێ مامەوە، نەشتێکمان خوارد و نەخواردمانەوە. گوتم با سوێندیان بدەم بەڵکوو پەندێکم پێ بڵێن، هێمان هیچم نەگوتبوو، گەنجەکەیان سەری هەڵبڕی و گوتی: "دەگەڵ کەسێک قسە بکە، کە دیداری بتخاتە بیری خودا و گەورەیی بەسەر دڵتدا کاریگەر بێ و بە زمانی کردەوە پەندت پێ بدا نەک زمانی ئاخافتن". وەسسەلام».ئەمە حاڵ و ئاستی چاودێری هەرە چاکانە کە نوقمی گەورەیی پەروەردگارن.

**ئاستی دووەم چاوێری پارێزکاران** و ئەسحابی یەمینە. ئەمانە کەسانێکن کە دەزانن پەروەردگار دەیانبینی و ئاگەداریانە و شەرمی لێ دەکەن، بەڵام نوقمی گەورەیی و شان‌وشکۆی نین و لە خۆیان دانەبڕاون و ئاگایان لە خۆیان و دەور و پشتیانە. ئەمە وەکوو ئەو کەسەیە کە خۆی رووت کردۆتەوە، منداڵێک دێتە ژوورەوە، شەرمی لێ دەکاو بە ویستی خۆی، خۆی دادەپۆشێ. بەڵام ئەویتریان وەکوو کەسێکە کە لە گزوگوممەت پادشایەک بێتە ژوورەوە، لە خۆڕاخۆی داپۆشێ و لەبەر ترس و گەورەیی خونکار خۆی لە دەلاقەوە بهاوێژێتە دەرو ببوورێتەوە و ئاگای لە خۆی ببڕێ.

ئەوەی لەم ئاستەدا بێ، دەبێ بەردەوام چاودێری هەڵس‌وکەوت و بیرووبیر و دۆخی خۆی کا. بۆ هەر کارێ کە دەیەوێ بیکا، چاوی لە دوو شت بێ:

**یەکەم:** بەر لەوەی کارێک بکا، تەنانەت لەو دەمەیرا کە بیری کارێکی بە دڵدادێ، گوێی لێ بگرێ

و ئاگەداری بێ و بەردەوام چاودێری بکاو بزانێ چ بیرێکی بە دڵدا رادەبووری. سەیری کا، بزانێ گەر بۆ خودایە، تەواوی کا، گەریش بۆ ئارەزووی نەفسە، بەرەنگاری بێ و لە خودا شەرم کاو لۆمەی خۆی بکا کە بۆچی ئەم داخوازەی بۆ هاتۆتە دی و رسوایی و ئابڕوو چوونی ئەنجامی ئەم کارە بە خۆی بڵێتەوە. لە دەسپێکی هەر بیرێکدا ئەم چاودێرییە پێویستە، چونکی لە خەبەردا هاتووە کە هەر جووڵە یان ورتەیەک کە بەندە بەویستی خۆی بیکا، سێ پرسی لە پێش رادەنێن: یەکەم بۆچی، دووەم چلۆن، سێیەم بۆ کێ.

یەکەم کە بۆ چی دەیکەی، واتای ئەمەیەکە پێت دەڵێن لە سەرت بوو بۆ خودای بکەی، جا بۆ ئارەزووی نەفس و شەیتانت کرد؟ گەر لەم پرسە خەڵست و وەرامی پرسیارەکەی بۆ خودا بوو، دەڵێن چلۆن؟ واتە چۆنت کرد؟ چونکە هەر کارێک مەرجێکی هەیە و داب و نەریت و زانیارییەک؛ ئەوەی کردت، بە گوێرەی مەرجی زانست بوو، یاخۆ بە نەزانی و بە ئاسان گرتت؟ گەر لەمەش بە سەلامەت پەڕایەوە و بە گوێرەی مەرجی کار، جێبەجێی کردبێ، دەڵێن بۆ کێ؟ واتە: لە سەرت پێویست بوو کە بێخەوشانە بۆ خودای بکەی، گەر بۆ ئەوت کرد پاداشت پێ دەدرێ، گەر بە رووبینی و مەرایی کردت، مزی خۆتی لێ بستێنە، گەر بۆ کرێی دونیا کردت تا بە نەخت یان قەرز مزی خۆت وەربگری، یان بۆ کەسیترت کرد، تووشی هەڵەی هێڵیلار هاتوویت و سزا دەدرێی؛ چونکە پێتیان گوتبوو کە: أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ[1] هەروەها فەرمووی: إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ[2].

هەرکەس ئەمەی زانی، گەر ژیر و وریابێ، لە چاودێری دڵی ناپرینگێتەوە. چاتریش وایە کە بیری سەرەتایی چاودێری بکا، چونکە گەر درێژەی هەبێ حەزی لە دڵدا چێ دەبێ، پاشان تەما بەسەر هەموو ئەنامیدا دادەسەپێ. پێغەمبەر فەرمووی: «اتّقِ اللهَ عندَ هَمِّکَ اذا هَمَمْتَ»، واتە: لەو دەمەیڕا کە هیممەتی کارێکت لە دڵدا هاتەدی، لەبەر خودا بپرینگێوە.

ناسینی ئەوە بیرانەی کە بەرەو خودان یان بەرەو ئارەزووەکانی نەفسن، زانستێکی گران و هێژا و بەنرخە. ئەوەی لەم زانستە بێبەش بێ، دەبێ هەردەم لە پەرای زانایەکی پارێزکاردا بێ و لە تیشکی زانستی کەڵک وەربگرێ؛ هەروەها لەو زانایانەی کە چاویان بۆ دونیا برسی بێ، خۆ بپارێزێ، چونکە شەیتان ئەوانی کردۆتە بریکاری خۆی. پەروەردگار بە داوودی گۆت: «ئەی داوود! لە دۆستایەتی ئەو زانایانەی مەستی بادەی دونیان، دووری بگرە، چونکە لە دۆستایەتی منت دوور دەخەنەوە؛ ئەمانە رێگرن لەسەر رێی بەندەکانی مندا». پێغەمبەر فەرمووی: «پەروەردگار ئەو کەسەی خۆش دەوێ کە لە کاتی شوبهەدا وردبین بێ و لە کاتی زاڵبوونی شاوەتدا، ئاوەز تەواو بێ». چونکە تەواوبوون لەم

---

١ ـ (قورئان، ٣/٣٩) تۆ بزانە دینی پاکژ هەر هی خوایە. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ١٩٤/٧) ئەوانەی کە بە جێی خودا ـ ئێوە هانایان پێ دەبەن، عەبدگەلێکن وەک خوەتان. (هـ)

دوانەدایە، کە راستەقینەی حاڵ بە چاوی دڵ بزانێ و پاشان بەفام و ئاوەزێکی تەواو بەرەنگاری شاوەتەکانی کا. هەروەها ئەم دوانە پێکڕا بەستراون: هەرکەس ئەقڵێکی نەبێ بۆ بەرەنگاوی شاوەت، چاوی وردبینیشی نییە لە کاتی شوبهەدا. بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس گوناحێکی کرد، ئاوەزی لێ جیابۆوە و چجار ناگەڕێتەوە». عیسا گوتی: «کارەکان سێ دەستەن: حەقێکی ئاشکرا بەجێ بێنە، واز لە هەڵەیەکی ئاشکرا بێنەو کێشەی ئەوانەش بۆ زانایەک بەجێ بێڵا».

**دووەم** چاودێرییە لە کاتی کاردا. کارەکانی مرۆڤ سێ بەشن: یان عیبادەتن، یان گوناحن، یان موباحن.

چاودێری بەسەر عیبادەتدا ئەوەیە کە بێخەوشانە بێ، دڵی تەیار بێ و سەرلەبەری نەریتەکانی رابگرێ و هەرچی چاکەیەکی زۆرتری بێ، خۆی لێ نەبوێرێ.

چاودێری لە گوناح ئەوەیە کە شەرم کاو پاشگەز بێتەوەو قەرەبووی هەڵەی کاتەوە.

چاودێری بەسەر موباحیشدا ئەوەیە کە بەڕێز بێ و لە کاتی چێژ وەرگرتن لە نیعمەتی خودا، دەهندەی ببینێ و بزانێ کە هەمیشە لە پێش چاوی خودای خۆیە. بۆ وێنە، گەر دابنیشێ، بەڕێزەوە دابنیشێ، کە رادەکشێ، بە سەرشانی راست و روو بە قیبلە راکشێ، گەر خواردنێ دەخوا، بە دڵ، لە بیرو یادی خودا خافڵ نەبێ؛ چونکە بیرکردنەوە لە هەموو عیبادەتێک هێژاترە. لە هەر خۆراکێکدا سەیر و سەمەری زۆر هەیە: لە ئافراندنی رواڵەت و تام و چێژو بۆن و بەرامەیدا، لەو ئەندامانەی کە خواردنی پێ دەخوا، وەکوو قامک و دان و دەم و گەروو و گەدە و جەرگ و ڕیخۆڵە، هەروەها ئەوەی خۆراکی پێ بە تام دەکرێ و ئەوەی خواردن رادەگرێ تا هەزم بێ و ئەوەی بۆ وەدەرنانی خواردن لە ڕیخۆڵە کار دەکا. ئەمانە هەمووی سەیر و سەمەرەی کردەی خودایەو رامان لەم کارانەدا عیبادەتێکی مەزنە. ئەمە ئاستی زانایانە. تاقمێ کە ئەم دەسکردانەی دەبینن، لە بەرانبەر گەورەیی ئافرێنەردا واقوورِ دەبن و نوقمی گەورەیی و زانایی دەبن. ئەمەش ئاستی تاک پەرستان و هەرەڕاستانە. هەندێک بە تووڕەییەوە سەیری خواردن دەکەن و بە کرێتی دەزانن -بە ئاوەژووی شاوەت- هەروەها سەیری نیازی خۆیان دەکەن و دەڵێن بریا پێویستمان پێ نەبایەو لەسەر ئەم نیازە رادەمێنن و بەردەوام چاودێری خواردنیان دەکەن؛ ئەمەش ئاستی پارێزکارانە. تاقمێکیش بە چاوی شاوەت سەیری دەکەن و هەردەم لەو بیرەدان کە چۆن دەتوانن باشترین و خۆشترین بخۆن و تا دەتوانن زۆر بخۆن، هەروەها رەنگە بیانوو بگرن بە چێشتلێنان و چێشتلێنەرو میوەو خۆراک و نەزانن کە هەموو ئەمانە دەسکردی خوای مەزنە و تیز لە ئافرێندراو گرتن، تیز لە ئافرێنەر گرتنە. ئەمە ئاستی بێ ئاگاو هۆش لێبراوانە. بۆ هەموو رەوایەک ئەم ئاستانە دێنە گۆڕێ.

**مەقامی سێیەم - پێڕاگەیشتنی پاش کار**

مرۆڤ دەبێ لە کۆتایی رۆژدا، بەر لە نووستن، کاتێ بۆ خۆی تەرخان کا کە بە نەفسی خۆی رابگاو سوود و زیانی مامەڵەی نەفسی لێک بداتەوەو جودای کاتەوە. سەرمایە فەرزەکانەو قازانج سوننەتەکان و زیان، گوناحەکانن. هەر وەکوو چۆن لەگەڵ شەریک و ئامبازی چەقە دەکا تا فێڵی لەگەڵ نەکا، دەبێ پتر لەوە ئاگەداری نەفسی بێ؛ چونکە نەفس گزیکار و فیلباز و خاپینۆکە، مەبەستەکانی خۆی بە عیبادەت پێت دەنوێنێ تا پێت وابێ قازانجت کردووە، رەنگە زیانیش بێ. دەبێ تەنانەت لە موباحەکانیش ورد بیتەوەو لێی بپرسیتەوە کە «بۆ چیت کرد و بۆ کێت کرد؟»

گەر نەفست هەڵەی کردبوو، دەبێ بۆتی ببژێرێ و قەرەوی کاتەوە. «ابن الصمّه» یەکێک لە گەورەکان بوو، کاری خۆی حسێب دەکرد، شەست ساڵ بوو، رۆژەکانی ژمارد، بیست و یەک هەزار و پانسەد رۆژ بوو، گوتی: «ئاخ! ئەگەر رۆژێ گوناحێکم کردبێ، چۆن لە بیست و یەک هەزار و پانسەد گوناح بخەلسم، بە دانستە کە رۆژ بووە هەزار گوناحم کردووە»، هاوارێکی کرد و کەوت، ویستیان هەڵیسێننەوە، بەڵام مردبوو.

مرۆڤ پێی ناکرێ بە تەواوی نووکوبەدی کارەکانی حسێب کا، گەر بۆ هەر هەڵەیەکی بەردێک لە ژوورەکەی باوێژێ، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا خانووەکەی تژی لە بەرد دەبی، هەروەها گەر کەرامولکاتبین مزی نووسینی لێ بستێنن، هەرچی هەیە دەبێ بیاندانێ. بەڵام گەر تەسبیحێ بگریتە دەست و رۆژی چەن جار بەبێهۆش و گۆش سوبحانەللا بلێ، یان بەبێ تەسبیح هەروا بلێ و بگاتە هەزار سوبحانەللاو هیوادار بێ کە تای چاکەکانی بەم چەشنە قورس بووبێ، ئەوە خەیاڵێکی خاوەو هۆکەشی بێ ئاوەزی و کەم فامییە. لەم سۆنگەوە عومەر گوتی بەر لەوەی کەسێکیتر کارەکانتان هەڵسەنگێنێ، خۆتان کارەکانتان لە پێوانە بدەن. عومەر کە شەو دادەهات، قەمچی لە ژێر پای خۆی دەداو دەیگوت ئەمڕۆ چیت کرد. عایشە دەڵێ: «ئەبووبەکر لە سەرەمەرگدا گوتی: "کەس لە لای من لە عومەر خۆشەویستتر نییە". پاشان گوتی: "چیم گوت؟" بۆم گێڕایەوە، گوتی: "نە، کەس لە لای من لە عومەر هێژاتر نییە". ئەمەشی لێک دایەوە چونکە راست نەبوو، دیسان پێیدا هاتەوە». ئیبنوسەلام باوەشێک هێزمی لەسەر پشتی ناو رۆیشتە دەرەوە. گوتیان: «مەگین خولامان ئەم کارە ناکەن». گوتی: «نەفسم رادێنم کە لەمەدا چۆن بێ». ئەنەس دەڵێ: «عومەرم بینی لە حەوشێکدا و لە پشت دیوارێکدا بە خۆی دەگوت: "بەخ بەخ! پێت دەڵێن ئەمیرەلموئمنین، سوێند بە خودا گەر لە پەروەرندەت نەترسی، ئازاری پەسڵانت بۆ خۆت کڕیوە"». حەسەنی بەسری گوتی: «نەفسی لەووامە، ئەوەیە کە لۆمەو سەرزەنشتی خۆی دەکاو دەڵێ ئەو خواردنەی کە خواردت، ئەو کارەی کە کردت، بۆچیت خوارد و بۆچیت کرد و لۆمەی خۆی دەکا». کەواتە راگەیشتن و حسێبکردنی رابردوو،

گەلێک گرینگە و ناچار دەبێ بکرێ.

**مەقامی چوارەم - سزادانی نەفس**

بزانە گەر بە نەفست ڕاگەیشتی و هەڵەیەکی کردبوو و وازت لێ هێنا، بە سەرتدا زاڵ دەبێ و ئیدی هیچت پێ ناکرێ.

بەڵکوو دەبێ بۆ هەر هەڵەیەکی سزا بدرێ: گەر شتێکی بە شوبهەوە خواردووە، بە برسیەتی سزای بدەو گەر سەیری نامەحرەمێکی کردووە، بە نەنواڕین و سەیرنەکردن ئازاری بدە و بە گشتی هەموو ئەندامانت بەم چەشنە بن، پێشوونان هەموویان وایان کردووە.

یەکێک لە خواناسان دەستی دا بە ژنێکەوە، دەستی لەسەر ئاور ڕاگرت تا دەستی سووتا.

یەکێک لە عابدانی بەنی ئیسراییل دەمێک بوو لە پەرستگایەکدا دوورەپەرێزی گرتبوو. ژنێک ڕۆیشتە لای، پایەکی لە پەرستگاکە هێنایە دەر کە بڕواتە لای، لەبەر ترسی خودا پاشگەز بۆوە و ویستی بگەڕێتەوە، گوتی: «نە، ئەم پێیە کە بۆ گوناح ڕۆیشتەدەر نابێ بگەڕێتەوە بۆ نێو پەرستگا»، ئەوەندە لە دەرەوە ڕایگرت تا لەبەر سەرما و گەرما وشک بۆوە و داڕزا.

جونەید دەڵێ: «ئیبنولکەریبی گوتی: "شەوێک شەیتانم پێکەنی، ویستم لەش پیسی دەرکەم، شەوێکی ئێجگار سارد بوو، نەفسم تەنبەڵی کرد و گوتی خۆت مەکوژە، ڕاوەستە تا بەیانی دەڕۆیتە گەرماو. سوێندم خوارد کە هەر دەبێ بە جلکەوە خۆم بشۆم. هەروا بە تەڕی جلکەکەمم کردە بەر و نەمکووشی و ئاویم دانەچۆڕاند، هەروا ڕاوەستام تا ئێوارە لە بەرمدا وشک بووەوە". گوتم ئەمەیە سزای نەفسێک کە لە ئاست خودایدا تەوەزەلی پیشەکا».

یەکێک سەیری ئافرەتێکی کرد، گوتی مەرج بێ لە سزای ئەم کارە قەد ئاوی سارد نەخۆمەوەو نەیخواردەوە.

حەسسان کوڕی ئەبیسەنان لە شوێنێکدا ڕادەبورد، باخێکی جوانی بینی، گوتی: «کێ ئەمەی کردووە؟» پاشان گوتی: «لە شتێک کە پێوەندی پێتەوە نییە، بۆچی دەپرسی؟ سوێند بە خودا کە بە یەک ساڵ ڕۆژووی بەردەوام سزات دەدەم».

بووتەڵحە لە باخی خورمایەکدا نوێژی دەکرد. مەلێکی جوانی بە بەرچاودا تێپەڕی، لەبەر جوانی ئەو مەلە ڕەکاتەکانی نوێژەکەی لێ تێکچوو. بۆیە باخی خورماکەی بە تەواوی دا بە سەدەقە و خێرات.

مالک کوڕی زەیغەم دەڵێ: «"ریاح القیسی" هات بۆ دیداری بابم. پاش نوێژی عەسر بوو، گوتم نووستووە. گوتی کەی کاتی خەوەو گەڕایەوە. بە دوویدا ڕۆیشتم، دەیگوت: "ئەی لاپرسەن، بۆچی

دەڵێی کەی کاتی خەوە؟ بە تۆچی کە دەپرسی؟ مەرج بێ تا ساڵیتر نەهێڵم سەرت لەسەر سەرین دانێ". دەڕۆی و دەگریا و دەیگوت: "مەگەر لە خوای مەزن ناترسی؟"».

"تەمیم داری" شەوێک خەو بردیەوەو بۆ شەونوێژ هەڵنەستا. بڕیاری دا کە یەک ساڵ هیچ شەوێ نەنوێ.

تەڵحە دەگێڕێتەوە کە: «پیاوێ خۆی رووت کردبۆوەو لەسەر ورد و زیخی داخی بیابان راکشابوو و دەیگوت: "ئەی مرداری بە شەو تەوەزەل و بە رۆژ بەتاڵپا! تا کەی؟" پێغەمبەر بەوێدا رادەبورد، راوەستاو فەرمووی: "بۆچی وادەکەی؟" گوتی: "نەفسم بە سەرمدا زاڵ دەبێ". گوتی: "لەم کاتەدا دەرگاکانی ئاسمانت بۆ ئاوەڵایە و خودا و فریشتەکانی شانازیت پێوە دەکەن". پاشان بە یارانی گوت: "توێشووی خۆتانی لێ بستێنن". هەموو دەڕۆیشتن و دەیانگوت دوعایەکی بەخێرمان بۆ بکەو یەک بە یەک بۆ هەموویان دەپاڕایەوە. پێغەمبەر فەرمووی دوعایەکی بەخێر بۆ هەموویان کە. گوتی: "پەروەرندەم! پارێزکاری بکە بە توێشوویان و لەسەر هێڵی راستیان دابنێ". پێغەمبەر گوتی: "خوایا! راوەستاوی کە"، واتە دوعایەکی بە خێرتری لە سەرزار دانێ. گوتی: "پەروەردگارم! بەهەشتیان بۆ بکە بە مەنزڵ"».

مەجمەع یەکێک لە گەورەکان بوو؛ جارێک سەیری سەربانێکی کرد، ئافرەتێکی دی. بڕیاری دا کە چجار سەیری ئاسمان نەکا.

ئەحنەفی قەیس شەوانە چرایەکی هەڵدەگرت و دەمبەدەم قامکی لەسەر رادەگرت و دەیگوت فلان رۆژ، بۆچی فلان کارت کرد و فلان شتت خوارد؟

پارێزکاران بەم جۆرە ژیاون، باش زانیویانە کە نەفس سەربزیو و سەرکەشەو گەر هەوساری توند نەکرێ و سزانەدرێ، راگیر نابێ و بەسەریاندا زاڵ دەبێ.

## مەقامی پێنجەم - تێکۆشانە

بزانە، هەندێ کەس کە نەفسیان تەمبەڵ دیوە، بە عیبادەتی زۆر، سزایان داوە. ئیبنی عومەر هەرکات کە نوێژێکی جەماعەتی دەفەوتا، ئەو شەوە تا بەیانی نەدەنووست. عومەر جارێک نوێژی جەماعەتی فەوتا، پارچە زەوینێک کەبایی دووسەد هەزار درهەم بوو، بە سەدەقەیدا. جارێک ئیبنی عومەر نوێژی شێوانی وەدرەنگ کەوت، تا دوو هەسارە لە ئاسمان وەدەرکەوتن، دوو کۆیلەی رزگار کرد. لەم سەربهوردانە زۆروزەوەندن.

هەروەها گەر کەسێک نەفسی بۆ عیبادەت کەوی نەبێ، دەبێ لە لای زانایەکی پارێزکار دابنیشێ تا بە دیدار و پەیڤین دەگەڵ ئەو، پاپای عیبادەتی لە دڵدا شینبێ. یەکێک دەیگوت هەرگا لە

عیبادەتدا سست دەبم، سەیری کۆشەوە محەممەدی کوڕی واسیع دەکەم، تا یەک حەوتە تامازرۆی عیبادەتم لە دڵ دەمێنێ. گەر کەسێکی وا دەست نەکەوت، چاتر وایە ژیان و سەربەهوردی پارێزکاران بخوێنێتەوە. ئێمە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

داوودی تایی نانی نەدەخوارد، وردەنانی دەخستە نێو ئاو و دەیخواردو دەیگوت: «لە ماوەی نێوان ئەمەو ئەو نانەی کە دەیخۆم، پەنجا ئایەتی قورئان دەخوێنم، بۆچی کاتی خۆم بە خەسار بدەم». یەکێک پێی گوت: «دەسەکێکی میچی خانووەکەت شکاوە». گوتی: «بیست ساڵە لەم خانووەدام و سەیرم نەکردووە». تەنانەت روانینی بێ کەڵکیان بە کرێت زانیوە.

ئەحمەدی رەزین لە بەیانیوە تا عەسر دادەنیشت و سەیری هیچ کوێی نەدەکرد. گوتیان: بۆچی وادەکەی؟ گوتی: «پەروەردگار چاوی ئافراند تا سەیری دەسکردە سەیر و سەمەرەکانی کا، گەر بە خۆڕایی و بێ کەڵک پێی بنواڕی، هەڵەت کردووە».

ئەبوودەردا دەیگوت: «ژیانم لەبەر سێ شت خۆش دەوێ: کڕنۆش لە شەوانی درێژ، تینوێتی لە رۆژانی درێژ و دانشتن دەگەڵ کەسانێک کە قسەیان ژیرانەو بەتوێکڵ و پڕواتایە».

لە عەلقەمەی کوڕی قەیسیان پرسی بۆ هێندە نەفسی خۆت ئازار دەدەی؟ گوتی: «چونکە زۆرم خۆش دەوێ، لە ئاوری دۆژەهی دەپارێزم». پێیان گۆت: ئەم هەمووە کارەیان لە سەرت فەرز نەکردووە. گوتی: «ئەوەی پێم بکرێ دەیکەم، تا بەیانی هەناسەسارد نەبم کە بۆچیم نەکرد».

جونەید دەڵێ: «کەسم نەدی وەکوو سری سەقەتی سەیر بێ، نەوەدو هەشت ساڵ ژیا و کەس نەیدی لای دابێلێ، مەگەر کاتێ کە مرد».

ئەبوو محەممەدی جەریری یەک ساڵ لە مەکەدا مایەوە و لەم ماوەدا نە هیچ ئاخاوت، نە خەوت و نەڕاکشا و نە پای درێژ کردەوە. بووبەکری کەتتانی پێی گوت: چۆنت توانی؟ گوتی: «پەروەرندەم راستی دڵی زانیم و لەشی بەهێز کردم».

یەکێک گوتی: فەتحی مووسڵیم بینی کە دەگریا و لە چاوی خوێن دادەباری. گوتم: چ بووە؟ گوتی: «ماوەیەک بەسەر گوناحەکاندا ئاودەگریام، هەنووکە خوێن بەسەر فرمیسکەکانمدا دەگریم نەکوا بێخەوشانە نەبووبێتن». لە خەودا دیتیان، گوتیان: خودا چی دەگەڵ کردی؟ گوتی: «پەروەردگار بە ڕێزی گرتم و گوتی: «سوێند بە گەورەییم چل ساڵە فریشتەکان نامەی کارەکانت دێنن، هیچ هەڵەم تێدا نەدی».

بە داوودی تاییان گوت: «چ دەبێ گەر ردێنت شانە کەی؟» گوتی: «ئەوسا پیاوێکی بێکارم کە خەریکی ئەم کارە دەبم».

وەیسی قەرەنی شەوەکانی دابەش کردبوو، دەیگوت ئەمشەو شەوی رکووعە، تا بەیانی لە رکووعدا

بوو؛ شەوی‌تر دەیگوت ئەمشەو شەوی کڕنۆشە، تا بەیانی لە کڕنۆشدا رادەوەستا.

«عتبة الغلام»، لەبەر کۆشەوەی هەرەزۆر، هیچ خواردنێکی خۆشی نەدەخوارد. دایکی پێی گۆت بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە، گوتی: «وام بە دووی بەزەیی ئەوەوە؛ چەن رۆژ خۆم دەڕەنجێنم و بۆ هەتاهەتا لە حەسانەوەو پشوودانڈا رایدەبوێرم».

رەبیع گوتی: «رۆیشتم تا وەیسی قەرەنی ببینم، کاتێ بینیم خەریکی نوێژی بەیانی بوو؛ گوتم با دوایی بێنێ و لە زیکر بێتەوە دەگەڵی قسەدەکەم. هەروا دانیشت و زیکری دەکرد تا نوێژی نێوەڕۆژەشی خوێند. نوێژی عەسریشی خوێند. تا نوێژی ئەم بەیانییەکەوە هەروا مایەوە. پاشان نەختێ چاوی خەو بردیەوە، داچڵەکاو گوتی: «پەروەرندەم! هانات پێ دەبەم لە دەستی چاوی خەوالۆ و زگی زۆرخواز». گوتم: ئەمەی کە بینیم بۆم بەسە، گەڕامەوە».

ئەبووبەکری عەییاش چل اڵ پاڵ نەکەوت، تا چاوی ئاوسیای هێنا. بیست‌ساڵ لە بنەماڵەکەی شاردیەوە و هەر رۆژ پانسەد رەکات نوێژی دەکرد و لە هەڕەمەی لاوەتیدا رۆژی سی هەزار جار «قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ»ی دەخوێند.

کەرز کوڕی وبرە لە رەبەنان بوو، کۆشەوەی وابوو کە رۆژێ سێ خەتمی قورئانی دەخوێند. گوتیان: زۆر خۆت دەڕەنجێنی. گوتی: تەمەنەنی دونیا چەندە؟ گوتیان: حەوت هەزار ساڵ. گوتی: ماوەی رۆژی پەسلان چەندە؟ گوتیان: پەنجا هەزار ساڵ. گوتی ئەوە کێهە کە حەوت رۆژ رەنج نەکێشێ تا پەنجا رۆژ پشوو نەدا؟ واتە گەر حەوت هەزار ساڵ بژیم و بۆ رۆژی پەسلان تێبکۆشم، هێشتا هەر کەمە، چ بگا بەوەی کە پەسلان هەتاهەتایە و تەمەنی دونیا لە ئاست ئەودا زۆرکەم و کورتە.

سەفیانی سەوری دەڵێ: «شەوێک رۆیشتم بۆ لای رابعە. ئەو رۆیشتە نێو میحراب و منیش لە سووچێکدا تا پارشێو خەریکی نوێژ بووین. پاشان گوتم: «چۆن سپاسی ئەو کەسە کەین کە یارمەتی داین تا بەیانی خەریکی نوێژ بین؟» گوتی: «بەوەی کە سبەینێ بەرۆژوو بین».

ئەمە سەربهوردی تێکۆشەرانی رێی خودا بوو. ئەم بەسەرهاتانە گەلێک زۆرن و لە کتێبی «ئەحیا» دا زۆرتر بێژراون.

بەندە هەرچەند ئەو شتانە نابینێ، با ئەم سەر بهوردانەوە بخوێنێ و پاپای عیبادەتی لە دڵدا بێتە دی و هەڵەو پەڵەی خۆی بناسێ و بەرەنگاری نەفسی کا.

## مەقامی شەشەم - لۆمەو سەرزەنشتی نەفس

بزانە، نەفس بە چەشنێ رسکاوە کە لە چاکە هەڵدێ و حەزی لە خراپەیەو پاشکۆی وی سستی و

تەوەزەلی و شاوەت بازییە؛ تۆش ئەمرت پێ کراوە کە بیهێنیەوە سەر هێڵی ڕاست و لە لارێ دەربازی‌کەی. ئەمەش هەندێ جار بە زۆر و برێ جار بە میهرەبانی و جار بە جاریش بە کردەوە و جارەوەختیش بە گوتن پێک دێت. چونکە نەفس بە چەشنێ ئافرێندراوە کە گەر خێر و قازانجی خۆی لە شتێکدا ببینێ، دەداتەپەی و هەرچەند تووشی ڕەنج و ئازاریش ببێ، لەسەر ئەو ئازارە پشوودرێژی دەکا. بەڵام زۆربەی پەردەی نێوان نەفس و ڕاستی، نەزانی و بێ ئاگاییە. بۆیە کە لە خەوت هەستاند و ئاوێنەیەکی روونت لە پێش چاوی ڕانا، دەیسەلمێنێ و قبووڵی دەکا. لەم سۆنگەوە خوداش فەرمووی: وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ[1]. نەفسی تۆش لە ماکی نەفسی کەسانی‌ترەو پەند و مۆچیاری و لۆمە بە سەریدا کاریگەر دەبێ.

کەواتە، سەرەتا پەند و مۆچیاری نەفسی خۆت کەو بە لۆمەو سەرزەنشت ئاگەداری کەوە، تەنانەت چجار لۆمەو سەرکۆنەی لێ مەگێڕەوە و بلێ: ئەی نەفس! خۆت بە لێزان و شارەزا دەزانی و گەر کەسێک بە نەفامت بزانێ تووڕە دەبی، دەسا کێ لە تۆ نەفامترە؟ گەر کەسێک خەریکی گاڵتە و یاری و جەفەنگ بێ لە کاتێکدا لەشکرێ لەبەر دەرگای شار چاوەڕوانێتی و کەسی ناردوون کە بیبەن و بیکوژن، کەچی ئەو واز لە یاری و گاڵتە نەهێنێ، دەسا کێ لەوە نەفامتر و گێلۆکەترە؟ لەشکری مردووان لەبەر دەرکی شار چاوەڕوانت دەکەن و بڕیاریان داوە تا تۆش نەبەن، لەوێ ڕانەبن؛ دۆژەەو بەهەشتیان بۆ تۆ ئافراندووە و ڕەنگە هەر ئەمڕۆ بتبەن، گەر ئەمڕۆش نەتبەن، دڵنیا بە کە سبەینێ دەتبەن؛ لە ڕاستیدا کارێک کە ڕوودانی بێ‌چەندوچوونە، بە ڕوودراوی بزانە؛ مردن بە کەس ناڵێ کە شەو دێمە سەر وەختت یان ڕۆژ، دێر دێم یان زوو، زستان یان هاوین، بەڵکوو لە پڕونەکاو پێسیری دەگرێ، تەنانەت لە کاتێکدا کە زۆر هێمنانە تووشیاری دەبی. جا کە خۆت بۆ هاتنی تەیار نەکردبێ، چ نەفامییەک لەوە زۆرتر! مخابن ئەی نەفس! هەموو ڕۆژێ خەریکی گوناحی؛ گەر پێت وایە خودا ناتبینێ، کافری، گەریش دڵنیای کە دەتبینێ، زۆر بێ شەرم و چەقاوەسۆی کە لە بەری ناپڕنیگیتەوە؛ گەر خولامێکت لە ئاست تۆدا وا نافەرمانی کا، چۆنی تەمێ دەکەی و لێی تووڕە دەبی، دەسا لە بەرچی پێت وایە خودا لێت زیز نابێ؟ گەر پێت وایە دەتوانی خۆت لە بەرانبەر ئازارەکانی ڕابگری، دەستت لەسەر شۆڵەی چراکەت ڕابگرە، یان ماوەیەک لەبەر تینی هەتاو دابنیشە، یاخۆ لە ژووری ئاگری گەرماودا بمێنەوە تا بزانی چەن بێ ئەنوا و بێ‌دەرەتان و بێ‌توانی؛ یاخۆ ڕەنگە پێت وا بێ لەسەر گوناحەکان سزا نادرێی، کەواتە بە قورئان و خودا و سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەر

---

1ـ (قورئان، ٥٥/٥١) تۆهەر وەبیریان بخەوە؛ بیرەوەری بەهرە دەدا بەوانەی خاوەن باوەڕن. (هـ).

کافر بووی، چونکە بە درۆزنیان دەزانی کە دەڵێن: «مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ[1] هەرکەس خراپەکا، خراپەی تووش دەبێ. مخابن! دەڵێی پەروەرندەم دلۆڤان و دلاوایەو سزام نادا. بۆچی سەتان هەزار هەزار خەڵک تووشی رەنج و برسێتی دەکا؟ بۆچی هەرکەس نەکێڵێ، نادرویێ؟ بۆچی کاتێ دەگەیتە شاوەت و ئارەزووت، لە هیچ فێڵ و گزییەک بۆ بە دەستهێنانی خۆ نابوێری و ناڵێی خودا دەهەندەیەو خۆی کارم بۆ پێک دێنێ. مخابن! دەڵێی وایەو کەچی توانی رەنج کێشانم نییە. نازانی کە نەختێ رەنجکێشان بۆ کەسێک کە توانی رەنجی زۆری نییە، پێوستترە، تا بەیانی لە ئازاری جەهەننەم بخەلسێ، چونکە هەرکەس تەقالا نەدا و رەنج نەکێشێ، لە رەنج و ئازار دەرباز نابێ. کە ئەمڕۆ توانی ئازارێکی کەمت نییە، بەیانی چۆن لەبەر دۆژەەو ئاور و سزا و سووکی و بێ دەرەتانی خۆ دەگری؟ مخابن! بۆچی بۆ بەدەستهێنانی زێروزیو ئەو هەموو ئازارە دەدەیتە بەر خۆ و بۆ بە دەستهێنانی تەندروستی بە گوتەی پزیشکێکی نەزان، واز لە شاوەتەکانت دێنی؟ ئەوەندە نازانی کە دۆژەەلە هەژاری و نەخۆشی ئەستەمتر و هەڵەترە، چونکە ماوەی دواڕۆژ لە تەمەنی دونیا درێژترە. مخابن! هەردەم دەڵێی کە لە هەڵەکانم پاشگەز دەبمەوەو کاری چاک دەکەم، کەچی رەنگە تا تۆ لەم بیرەی، مردن ببێتە میوانت و نسک و ناهمێ بمێنیتەوە؛ گەریش وا بیر دەکەیتەوە کە سبەی تەوبە ئاسانترە، ئەوە بەڵگەی نەزانی و گەوجییە، چونکە هەرچەند بیخەیتە دواوە دژوارتر دەبێ. کە مردنیش گەیشت، ئەوساتەو بەو پاشگەزبوونەوە هیچ کەلکی نییە. ئەمە چیرۆکی ئەو کەسەیە کە بۆ فێربوونی زانست رێگایەکی دوور دەگرێتە بەر و دەڕواتە شارێکیتر، بەلام لە خوێندنیا سستی و تەمبەڵی دەکاو دەڵێ رۆژی گەڕانەوە دەرس دەخوێنم. کەچی نازانێ فێربوونی زانست رۆژگارێکی درێژی دەوێ. هەروەها نەفسی بەدکرداریش ماوەی زۆر دەبا تا بە کۆشەوە و تەقالا پاکژ بکرێتەوەو بگاتە ئاستی زانین و هۆگری و خۆشەویستی و هەموو ملەکانی رێگا ببڕێ؛ کە تەمەن رابورد و بە خەسار درا، ئەم دەرفەتە لە کوێ دێنی؟ بۆچی گەنجی بەر لە پیری و تەندروستی بەر لە نەخۆشی و دەوڵەمەندی بەر لە هەژاری و ژیان بەر لە مردن بە هەل نازانی؟ بەداخەوە! بۆچی لە هاویندا پێداویستیەکانی زستان پێک دێنی و چاوەنۆڕی بەزەیی و بەخشندەیی خودا نابی؟ خۆ کزە و سۆزی دۆژەەکەمتر لە سەرمای زستان نییە و تینی ئاگری جەهەننەم کەمتر لە گەرمای هاوین نییە، لەمانەدا کورتی ناکەی، کەچی لە کاری دواڕۆژدا سنگە سنگ دەکەی. هۆ هەمووی ئەمانە، بێ بڕوابیە بە رۆژی پەسلان.

ئەم کفرە لە دڵتایە، کەچی لە خۆتی دەشاریتەوە و هەر ئەمەش دەبێتە مایەی فەوتانی هەتاهەتاییت. مخابن! هەرکەس پێی وا بێ کە بەبێدالدەی تیشکی زانست، ئاوری شاوەت لە پاش

---

١ ـ قورئان، ١٢٣/٤.

مردن توخنی ناکەوێ، وەکوو ئەو کەسەیە کە پێی وابێ بە سەرمای زستان بە بێ دەبەرکردنی کەوا و تەنیا بە بەزەیی و دلۆڤانی خودا دەتوانێ خۆی لە سەرما بپارێزێ. کەچی نازانێ ئەوەی کە زستانی ئافراند، تۆی بۆ چێ‌کردنی کەوا ڕێنۆمایی کرد، نەک بە بێ کەوا گەرمت کاتەوە. پێت وا نەبێ ئەوەی کە بە هۆی گوناحانتەوە تووشیاری سزادانت دەکەن، ئەوەیە کە لەبەر هەڵەو پەڵەت خودا تووڕە دەبێ، تا بڵێی هەڵەی من چ زیانێ لە خودا دەدا؟ چونکە وا نییە، ئاوری دۆژەڵە سۆنگەی شاوەتەوە لە ناخی دڵی خۆتدا پێ دەبێ؛ هەر وەکوو چۆن لە سۆنگەی ژارێکەوە کە دەیخۆی نەخۆشی لە دەروونتدا چێ دەبێ، نەک بە بۆنەی تووڕەبوونی پزیشک لەبەر نافرمانی خۆتەوە. مخابن! تۆ کە گیرۆدەی چێژو خۆشی دونیای و بە دڵ هۆگری بوویت و هیچ بڕوات بە جەهەننەم و بەهەشت نییە، بەڵام خۆ بڕوات بە مردن هەیە، مردنێ کە لەم خۆشییانەت دادەبڕێ‌و لەدووری دونیا دڵت دەسووتێنێ، هەرچەند پێت‌خۆشە ئەم خۆشەویستیە پتەوتر کە، چونکە ڕەنجی دووری بە قەدەر خۆش‌ویستنە. ئەی داد!

بۆچی دونیات لە کۆش گرتووە! گەر نووک‌وبەدی دونیات پێ بدەن، لەم پەڕ هەتا ئەو پەڕی دونیا کڕنۆشت لەبەر بەن و ئەڵقە لە گوێت بن، هەمووی چەن ڕۆژەو کە مردی خۆت و ئەوان دەبنە خۆڵ و هیچتان لێ نامێنێتەوە و کەس یادتان لێ ناکاتەوە، هەروەک چۆن لە خونکارانی ڕابردوو یادێ ناکرێتەوە. چونکە لە دونیا بێجگە لە نەختێ، چیترت پێ نادرێ و ئەو نەختەش پڕ لە خەوش و نالەباریە، بەهەشتی هەتاهەتایی بەمە دەفرۆشی! بەداخەوە! گەر کەسێک دەفرەگڵینەیەکی شکاو لەگەڵ گەوهەرێکی بە نرخ بگۆڕێتەوە، چۆنی پێ پێدەکەنی؟ دونیا دەفرە گڵینەیەکەو ئەنجامی شکانەو ئەو گەوهەرە دەفەوتێنی و هەناسەساردی دەبێتە بەشت. بەم چەشنە بەردەوام لۆمەی نەفست کە تا مافی خۆتت بەجێ‌هێنا بێ و سەرەتا پەندت بە خۆت دابێ. وەسسەلام.

## بنەمای حەوتەم- بیر کردنەوە

بزانە پێغەمبەر فەرمووی: «تَفَکُّرُ ساعةٍ خَیرٌ من عبادةِ سنة»؛ یەک کاتژمێر بیرکردنەوە چاترە لە یەک ساڵ عیبادەت. لە قورئاندا لە زۆر شوێندا دەستووری رامان و وردبوونەوەو وەرددانەوە دراوە و ئەمانەش هەموویان بیرکردنەوەن. هەرکەس هێژایی بیرکردنەوە دەزانێ، بەڵان کەس راستەقینەو چەن‌وچوونی نازانێ و نازانێ کە ئەم بیرکردنەوە چییە و بۆ چییە و بەرهەمی چییە. بۆیە لێرەدا راڤەی دەکەین. سەرەتا باس لە هێژاییەکەی دەکەین، پاشان راستەقینەی، ئینجا هۆی تێرامان و پاشان ئەوەی بیرکردنەوەی تێدایە.

### هێژایی بیرکردنەوە

دەبێ بزانی کارێک کە یەک ساعەتی هێژاترە لە یەک ساڵ عیبادەت، دەبێ زۆر بەرز بێ. ئیبنی عەبباس دەڵێ: «تاقمێ لەمەڕ خودا بیریان دەکردەوە، پێغەمبەر فەرمووی: "لە دەسکردەکانیدا بیرکەنەوە نەک لە خۆیدا، چونکە پێتان هەڵناگیرێ و رادەی ناناسن"». عایشە دەڵێ: «پێغەمبەر شەونوێژی دەکرد و دەگریا، گوتم: "بۆچی دەگری پێغەمبەری خودا، تۆ کە هەڵەکانت بەخشراون؟" فەرمووی: "بۆچی نەگریم کە ئەم ئایەتەم بۆ هاتۆتە خوار "اِنّ فی خَلقِ السَّموات وَالأرضِ وَاختِلافِ اللَّیلِ وَالنَّهارِ لَآیاتٍ لِاُولی الألبابِ"». پاشان فەرمووی: "هاوارە لەو کەسەی ئەم ئایەتە ببیسێ و بیر نەکاتەوە"». بە عیسایان گۆت: «لەسەر زەویندا وەکوو تۆ هەیە، ئەی رۆحی خودا؟» گوتی: «هەیە، هەرکەس پەیڤی یاد کردن بێ و بێدەنگیەکەی بیرکردنەوە بێ و روانینی پەند گرتن بێ، ئەوە وەکوو منە». پێغەمبەری ئێمەش فەرمووی: «چاوەکانتان لە عیبادەت بێ بەش مەکەن». گوتیان: «چلۆن؟» گوتی: «خوێندنی قورئان لە رووی کتێب، بیرلێکردنەوەی و پەند وەرگرتن لەسەمەرەکانی».

ئەبووسلەیمانی دارانی گوتی: «بیرکردنەوە لە دونیا حیجابی دوارۆژە و بیرکردنەوە لە دوارۆژ،

ئەنجامی هۆزانی و ژیانەوەی دڵەکانە». داوودی تایی شەوێک لە سەربان بیری لە مەلەکووتی ئاسمان دەکردەوە و دەگریا، لە بانەوە کەوتە نێو حەوشێ جیرانی. هاوساکەی شیری دەرکێشا، پێی وابوو دزە، کە چاوی پێکەوت گوتی کێ تۆی خستە خوارەوە؟ گوتی نازانم ئاگام لێ نەبوو.

## راستەقینەی بیرکردنەوە

بزانە واتای بیرکردنەوە، گەڕان بە دووی زانستە. هەر زانستێک کە بەراشکاوی دیار نەبێ، دەبێ بۆی بگەڕی. ئەم گەڕانەش دەبێ وابێ کە دوو زانست پێکڕا کۆوەکەی و پێکڕایان نزیک کەیتەوەو لەم دوانە، زانیاریەکیتر بێنیتەدی؛ هەروەک لە نێرومێ منداڵێک دێتە دی، ئەو دوو زانیارییە وەکوو دوو بنەمان بۆ ئەم زانیارییە سێهەمە؛ پاشان ئەم سێیەمینەش لەگەڵ زانیاریەکیتر کۆوە دەکەی تا چوارەمین بێتە دی؛ هەروا بەردەوام و دوابەدوا زانیاریتر دێتە دی. هەرکەس بەم چەشنە زانیاری بەدەست ناهێنێ، هۆی ئەوەیە کە لە زانیارییەک کە بنەمایە، تێنەگەیشتووە. ئەمە وەکوو کەسێکە کە سەرمایەی نەبێ و مامەڵە و بازرگانی پێ نەکرێ. گەریش زانیاریە سەرەکییەکان دەزانێ، هی ئەوەیە ناتوانێ پێکڕا کۆیان کاتەوە؛ وەکوو کەسێک سەرمایەی هەیە، بەڵام بازرگانی نازانێ.

لێکدانەوەی راستەقینەی ئەمە دوورو درێژە. لەم بابەتەدا وێنەیەک دێنینەوە، ئەوەش ئەوەیە کە گەر کەسێک دەیەوێ بزانێ کە دوارۆژ چاترە یا دونیا، دەبێ دوو شت بزانێ: **یەکەم** ئەوەی کە باقی لە فانی چاترە و **دووەم** ئەوەی کە دوارۆژ هەتاهەتایە و دونیا ناپایەدارە؛ کە ئەم دوو بنەمایە زانی، ناچار تێدەگا کە دوارۆژ چاتر لەم دونیایە. مەبەستمان لە هاتنەدی ئەم زانیارییە ئەوە نییە کە موعتەزیلە دەیانەوێ و راڤەی ئەمەش دوور و درێژە.

راستەقینەی هەموو بیرکردنەوەکان گەیشتن بە زانیارییە کە لە کۆوەکردنی دوو زانیاری لە دڵدا دێتە دی؛ هەروەها چۆن لە جووتبوونی دوو ئەسپ، مەڕێک نایێتە دی، لە کۆوەبوونی دوو زانستیش هەر زانستێک بەدی نایە. بەڵکوو هەر زانیارییەک دوو بنەمایتری هەیە، تا ئەو دوو بنەمایە لە دڵدا تەیار نەکەی، ئەو بیرە نوێیە نایەتەدی.

## راڤەی ئەوەی کەسەبارەت بە چی بیردەکرێتەوە

بزانە، مرۆڤ لە تاریکی و نەزانی ئافرێندراوە، نیازی بە رووناکیەک هەیە تا لەو زەنگارە دەربێ و رێ بباتە سەر کاری خۆی و بزانی کە دەبێ چ بکاو لە کوێوە بڕوا: بەرەو دونیا دەبێ بڕوا یان بەرەو داوڕۆژ، دەبێ بپەرژێتە سەر خۆی یان خوای. ئەمەش ئاشکرا نابێ مەگین بە تیشکی زانست. ئەم تیشکەش لە بیرکردنەوە دێتە دی. هەروەک لە خەبەردا هاتووە کە: «خَلَقَ اللهُ الخَلقَ فِی ظُلمَةٍ ثُمَّ رشَّ

عَلَیهِم مِن نُورهِ»؛ هەروەکوو چۆن کەسێک لە تاریکییەکی ئەنگوستەچاودا ڕێگا دەرناکاو بەردە چەخماخ لێک دەداو ئاور پێدەکاو لەبەر تیشکی ئەو ئاورە ڕاستەڕێ دەردەکاو وینا و شارەزا دەبێ و درێژە بە ڕێگای دەدا؛ جا ئەو دوو زانیارییەی کە بنەمان و کۆوە دەبن و زانیاری سێیەمیان لێ دێتەدی، وەکوو ئەو بەردە چەخماخەو ئاسنەیە؛ هەروەها بیرکردنەوە وەکوو بەرد و ئاسن پێکدادانە؛ زانیاریش وەکوو ئەو ڕووناکییە یە کە لەوانەوە دێتە دی و گۆڕان بەسەر دڵدا دێنێ؛ کە دڵ ئاڵ و گۆڕی بە سەردا هات، کاریش گۆڕانی بە سەردا دێ؛ کە تێگەیشت دواڕۆژ بە نرختر لە دونیایە، پشت لە دونیا و ڕووی لە دواڕۆژ دەکا.

کەواتە بیرکردنەوە بۆ سێ شتە: زانیارییەک، دۆخێک و کردەوەیەک. کردەوە پاشکۆی دۆخەو دۆخیش پاشکۆی زانیارییە و زانیاریش پاشکۆی بیرکردنەوەیە. کەواتە بیرکردنەوە بنەماو بناغە و کلیلی هەموو چاکەیەکە و لەمە هێژاییەکەی ئاشکرا دەبێ.

## شرۆڤەی ڕێچکەی بیرکردنەوەکە لەچی دایەو بەرەو کوێ دەڕوا

بزانە، مەوداو ڕێچکەی بیرو ئەندێشە بێ کەوشەنە؛ چونکە زانستەکان بێ سنوورن و بیریش لە هەموویاندا دەگەڕێ، بەڵام هەرچی پێوەندی بە دینەوە نەبێ، ڕاڤەی ئەو لەم باسی ئێمەدا ناگونجێ. بەڵام ئەوەی پێوەندی بەڕێبازی دینەوە هەیە، هەر چەند شرۆڤەی بێ ڕادەیە، بەڵام بە کورتی و بە سەرچڵی باسەکەدا دەڕۆین.

بزانە، مەبەستمان لە ڕێبازی دین، مامەڵەی نێوان بەندەو پەروەرندەیە کە بەو کردەوانە دەگاتە خودا، مرۆڤ یان لە خۆیدا ڕادەمێنێ یا خۆ لە خوادا: گەر لە خوادا ڕامێنێ، یان لە خودی خوایە یا لە دانستەکانی یاخۆ لە کردە سەیر و سەمەرەکانی. گەریش لە خۆیدا تێفکرێ یان لەو کردانەیە کە خودا بە کرێتیان دەزانێ و بەندە لە خوا دوور دەکاتەوە و ئەوانەش گوناحەکان و کوشندەکانن، یا خۆ لەو شتانەدا ڕادەمێنێ کە خودا پیێ خۆشەو لێی نزیکی دەکاتەوە، ئەوانەش عیبادەت و دەربازکەرەکانن. کەواتە، ئەم چوار مەودایە کە بیری تێدا دەکاتەوە. بەندە وەکوو ئەڤیندارەکە بێجگە گراوەکەی بیر لە چیتر ناکاتەوە، گەر کردیەوە، ئەوینەکەی ناتەواوە، چونکە ئەوینی تەواو ئەوەیە کە هیچ شتێکی نەهێشتبێتەوە.

کەواتە بیری ئەویندار یان لە جوانی و خوشیکی خۆشەویستەکەیە یان لە جوانی هەڵس و کەوتی و ئاکاریدایە؛ گەریش بیر لە خۆی کاتەوە، یا بیر دەکاتەوە کە چۆن خۆی بنوێنێ و چۆن هەڵس و کەوت کا کە ئازیزەکەی حەزی لێ بێ، یان ئەو شتانەی کە گراوەکەی بێزی لێ دێ و بەسهێتی دەزانێ، بناسێ و خۆی لێیان ببوێرێ. هەر بیرێک کە بە پێی خۆشەویستی بێ لەم چوار بازنە بەدەر

نییە. بیری ئەڤینی دین و خۆشەویستی پەروەردگاریش هەروایە.

**هێلی یەکەم**

ئەوەیە کە لە خۆیدا رامێنێ و دانستەو کردەوە کرێتەکانی خۆی بناسێ و خۆی لێیان پاکژ کاتەوە. ئەمانەش یان هەڵە و پەڵەی ئاشکران یاخۆ ئاکاری دزێوّن لە دەروونا. ئەمەش زۆر و فراوانە، چونکە هەڵەکانی روالەت، هەندێکیان هی حەوت ئەندامن -وەکوو زمان و چاو و دەست و...- و برێکیان هی هەموو لەشن؛ خراپەکانی دەروونیش هەروان. بیر و ئەندێشە لە هەریەک لەمانەدا سێ مەودای هاتوچۆی هەیە:

**یەکەم** ئەوەیکە فلانکار و فلان دانستە کرێتە یان نە، چونکە ئەمە لە هەموو شوێنێدا ئاشکرا نییە و بە بیرکردنەوە دەزانرێ.

**دووەم** ئەوەیەکە گەر کرێتە، منیش هەروام یان نە، چونکە دانستەکانی نەفس بە سانایی ناناسرێن، مەگین بە بیرکردنەوە.

**سێیەم**، گەر رمووەدەی ئەم ئاکارە کرێتەیە، رێی دەربازبوونی چۆنە؟

کەواتە دەبێ هەموو بەیانیەک، ماوەیەک بۆ ئەم بیرە تەرخان کا و یەکەم بیری گوناح ئاشکرا کات: سەرەتا لە زمانەوە دەست پێ بکاو بیری لەسەر بکاتەوە، چونکە رەنگە لەم رۆژەدا تووشی گوناح بێ و بپەرژێتە سەر خوسپە و درۆ؛ بیرکاتەوە کە چۆن دەتوانێ خۆی لێ ببوێرێ؛ هەروەها گەر بۆی هەیە کە نانی حەرام بێتە نێو خوانی، دەبێ بیر لە چارەیەک کاتەوە کە چۆن خۆی لێ بپارێزێ. هەروەها هەموو ئەندامانی کە لە مەترسی تووشیاری هەڵەو پەڵە بووندان، رامێنێ. هەروەها بیر لە عیبادەتەکانی کاتەوە. کە لەمانە بووەوە بیر لە ئاکارگەلی بەرزکاتەوە و خۆی پێیان بخەملێنێ. بۆ وێنە بڵێ کە زمانیان بۆ یادی خودا و دڵخۆشی موسوڵمانان ئافراندووە، من کە دەتوانم، با فلان زیکر بڵێم و فلان قسەی جوانیش بڵێم تا دڵی خەڵکی پێ خۆش کەم. هەروەها چاویان بۆیە ئافراندووە تا داوی دین بێ و بەم داوە بەختەوەری پێ راو بکەن. بەم چاوانەم، بە چاوی رێز و گەورەیی سەیری فلان زانا دەکەم و بە چاوی سووکی و بێنرخی سەیری فلان خراپکار دەکەم تا مافی چاوم بە جێ هێنابێ. هەروەها ماڵوسامانیان بۆ ئاسوودەگی موسوڵمانان خولقاندووە، فلان ماڵ بە سەدەقە دەدەم و گەر خۆم پێویستمە، پشوودرێژی لەسەر دەکەم و لە رێی خوادا بەختی دەکەم. با هەموو رۆژ ئەم بیرانەی بە مێشکدا بێ و بە یەک ساعەت بیرکردنەوە لە سەرەتای هەر رۆژدا، بۆ هەموو تەمەن بیری خۆی بحەسێنێتەوە و خۆی لە گوناح بپارێزێ. ئەم چەشنە بیر و رامانەیە کە یەک ساعەتی هێژاترە لە یەک ساڵ عیبادەت؛ چونکە قازانجی بۆ هەموو تەمەنە. کە لە بیرکردنەوە لەسەر عیبادەت و

گوناحەکان بووەوە، بیر لە ناخی دڵی کاتەوەو ئاکارە خراپەکان لێک بداتەوەو بزانێ کامیانی هەیەو لە ئاکارە بەرزەکان ورد بێتەوەو بزانێ کامیانی نییە و خۆی بە لابردنی ئەو و زیادکردنی ئەم بخەملێنێ. راڤەی ئەمەش دوور و درێژە. بەڵام بنەمای کوشندەکانی دڵ دەن. گەر لەو دەیە رزگار بێ، خەلستووە؛ ئەوانەش بریتین لە: رژدی، لووت بەرزی، دەمارزلی و مەرایی و ئێرەیی و توندی و توورەیی، شاوەتی خۆراک و ئاخافتن و هۆگری ماڵوسامان و پلەو پاگە. رزگاریدەرەکانیش دەن: تەوبە، پەشیوانی لە گوناح، پشوودرێژی لەسەر بەڵا، رازیبوون بە قەزا، شوکرانەبژێری نیعمەت و بەرانبەر گرتنی ترس و هیوا و پارێزکاری لە دونیا و دلبێشی لە عیبادەت و رووی گەش لەگەڵ خەڵک و دۆستایەتی دەگەڵ خودای مەزن. هەریەک لەمانە مەوداو ماوەی زۆر و زەوەندیان بۆ رامان و بیرکردنەوە هەیە و هەروەک لەم پەرتووکەدا باسمان کرد، دەبێ بیانناسێ. بەندە دەبێ کاغەزێک بۆ خۆی دابنێ و ئەم تایبەتمەندییانەی لەسەر بنووسێ؛ کە لە وردبوونەوەو شرۆڤەی یەکێکیان بووەوە، دیاری بکاو بیر لە یەکێکیتریان کاتەوە. رەنگە هەرکەس بە گوێرەی کەلکەلەکانی بیر لە هەر یەکیان کاتەوە. وەکوو زانایەکی پارێزکار کە خۆی لەم هەمووە پاکژ کردبێ، بەڵام زۆر جار بۆی هەیە تووشیاری لووتبەرزی بێ و بە زانستی خۆی خەرە بێ و عیبادەت و رواڵەتی لە پێش چاو خەڵکی تەکووز و بەدەوکاو بە قبووڵی خەڵکی شاد بێتەوە. هەروەها گەر کەسێک رەخنەی لێ بگرێ، لێی زویر دەبێ و دڵی لێ دەگۆڕێ و هان دەدا تۆڵەی لێ بستێنێتەوە. ئەمانەش هەمووی خراپەکاریە، هەر چەند بەرپیوار و نادریارە، بەڵام ئەمانە گەرای فەوتێنەری دینن. بۆیە دەبێ هەموو رۆژێ لەم چەمکەدا رامێنێ و بیرکاتەوە و بزانێ چۆن دەتوانێ لەم مێملە بخەلسێ، چۆن دەتوانێ بگاتە ئاستێ کە بوون و نەبوونی خەڵک لە لای وەک یەک بێ و هەموو کارێکی تەنیا لەبەر خودا بێ و بەس. لەم بابەتەشدا مەودای زۆر بۆ رامان هەیە. لەم باسە کورتەدا خویان بوو کە رامان لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤدا، دوایی بۆ نییە، بۆیە بە وردی لێک نادرێتەوە.

**هێڵی دووەمی رامان، لە مەڕ خودایە**

رامان لەمەڕ خودا یان لەسەر خودی خودا و دانستەکانیە، یاخۆ لەسەر کردەوەو دەسکردەکانی؛ گەورەترین مەقام، رامانە لەسەر خودی خودا و دانستەکانی، بەڵام چونکە ئاوەزی خەڵک پێی ناگاو خوستی لێ دەبڕێ و برشتی نامێنێ، شەرع رێ پێ نادا: «فَأَنَّكُم لم تَقدِرُوا قَدرَهُ». ئەم ئەستەمی و دژوارییە لەبەر داپۆشراوی و بەرپیواری گەورەیی خودا نییە، بەڵکوو لەبەر رووناکییە؛ چونکە ئەو ئێجگار رووناکەو دڵی مرۆڤ هێندە لاوازە پێی هەڵناگیرێ و فامی ناکاو واقی وڕدەمێنێ.

وەکوو شەڤکۆر کە بە رۆژدا نافڕێ و چاوی توانی دیتنی ئەو تیشکەی نییە و بە شەو هەڵدەفڕێ.

بەڵام سەر لە ئێوارێ کە نەختێ ڕووناکی هەتاو مابێ، دەتوانن بفڕن. خەڵکی ڕەمەکی لەم ئاستەدان. هەرەڕاستان و گەورەکان توانی ئەو سەیر کردنەیان بۆ ماوەیەکی زۆر کورت هەیە، هەرچەند کە زۆر بخایەنێ ئەوانیش وەڕس دەبن؛ وەکوو خەڵکی کە سەیری هەتاو دەکەن، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت، کە زۆر بخایەنێ ڕەنگە وینایی چاویان لە دەست بدەن. هەروەها ئەم سەیرکردنە بۆی هەیە ئاوەزی مرۆڤ تێک بدا. کەواتە ئەو شتەش کە گەورەکان لەمەڕ دانستەکانی پەروەردگار دەیزانن، ئێزنیان نییە بۆ خەڵکی ڕەمەکی بیگێڕنەوە، مەگین لە پەیڤێکی ئاساییدا کە خەڵک بۆیان فام بکرێ. وەکوو بڵێی زاناو مورید و بێژەر، لەمەدا هەمان شت هەڵدەگرن کە لە ماکی خۆیانەو کەچی ئەمە تەنیا چواندنێکە. دەبێ هەر ئەمە بڵێی کە پەیڤی ئەو، وەکوو ئاخافتنی تۆ نییە، ئاخافتنی تۆ پیت و دەنگە و یەکگرتوویی و دابڕانی تێدایە و گەر ئەمە بڵێی ڕەنگە فامی نەکاو بە جێی سەلماندن و دان پێدانان، بەربەستی بێ و حاشای لێ بکا. هەروەک گەر پێی بڵێی زاتی ئەو نە وەکوو زاتی تۆوە، چونکە نە جەوهەرە و نەک عەرەز، نە لە شوێنێکدایەو نە لەسەر شوێنێک و نە لە ڕەهەندێ، نە بە جیهانەوە نووساوە و نە دابڕاوە و نە لە دەرەوەی جیهانەو نە لە ناوەوەی جیهان؛ کە ئەمەشی پێ بڵێی حاشای لێ دەکاو نایسەلمێنێ، چونکە بەرێژەی خۆی هەڵیدەسەنگێنێ و هیچ لەم گەورەییە فام ناکا. ئەو گەورەییە کە خەڵکی ڕەمەکی دەیزانن و فامی دەکەن، گەورەیی خونکارانە کە لەسەر تەختێ ڕۆدەنیشن و خولام و نۆکەر پەراییان دەکەن. هەروەها لە دالغەی خۆیاندا ڕواڵەتێکی بۆ وێنا دەکەن و دەست و پێ و سەر و گوێ و چاوی بۆ دەکێشن و وادەزانن بە بێ ئەمانە ناتەواوە. مێشیش هەروایە، گەر ئاوەزێکی بایە و بیری بکردایەتەو دەیگوت کە ئافرێنەری من دەبێ پەڕوباڵی بێ، چۆن دەبێ کە شتێک بۆ من بخولقێنێ و خۆی لێی بێبەش بێ؛ مرۆڤیش هەروایە، هەموو کارێک بە ڕێژەی خۆی هەڵدەسەنگێنێ. لەم سۆنگەوە شەرع دەڵێ لەسەر خودا بیر مەکەنەوەو پێشوونانیش دەڵێن توخنی کەلام مەکەون و بە ڕەوایان نەزانی کە بەراشکاوی بڵێن خودا لەم جیهانە نییەو لە دەرەوەی ئەم جیهانەش نییە و بەردەوام نییەو دابڕاویش نییە؛ بەڵکوو بەم پەیڤە کە لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ[1] چونکە هیچ شت وەکوو ئەو نییە. ئەمەشیان بە کورتی گوت و لێکیان نەداوە. شرۆڤەی ئەم باسەیان بەداهێنانێکی نەشیاو دەزانی، چونکە فامی زۆربەی خەڵک تیێ ناگا و پیێ ناگا. لەم سۆنگەوە وەحی هاتە سەر هەندێ لە پێغەمبەران کە «بەندەکانم لە دانستەکانی من ئاگەدار مەکەرەوە، ئەو شتەیان پێ بلێ کە تێی دەگەن». کەواتە، چاتر وایە ئەم باسە نەکەن و لەم بابەتەش ڕانەمێنن، مەگین کەسێک کە تەواو بێ و زۆر شارەزا بێ؛ هەرچەند ئەم کەسەش تووشی

---

١ ـ (قورئان، ١١/٤٢) هیچ شتێ وێنەی ئەو نییە؛ هەر خۆی بیسەر و بینایە. (هـ)

سەرسامی و واقی دەبێ.

کەواتە، دەبێ گەورەیی خودا لە ڕێی دەسکردە سەیر و سەمەرەکانیەوە بناسرێ، چونکوو هەرچی لەم جیهانەدایە تیشکێکە لە کانی ڕۆناهی و هێز و گەورەیی پەروەردگار. گەر کەسێک توانی ئەوەی نییە ڕاستەوخۆ سەیری هەتاو کا، خۆ توانی ئەوەی هەیە کە سەیری ئەو تیشکانەی کا کە بە سەری زەویدا دەبارێن.

**شرۆڤەی ڕامان لە دەسکردە سەیرەکانی پەروەردگاری مەزن**

بزانە، هەرچی لە بووندایە، دەسکردی خودایە و هەمووشیان سەیر و سەمەرەن و هیچ وردیلەیەک لە وردیلەکانی زەوی و عاسمان نییە کە بە زمانی حاڵ پەسن و زیکری ئافرێنەری خۆی نەکا و نەڵێ: هەر تۆی خێوی دەسەلاتێکی تەواو و زانستێکی بێ سنوور. ئەمە بەرفراوانتر لەوەیە کە شرۆڤە بکرێ؛ گەر سەرلەبەری دەریاکان ببنە دەوات و هەموو دارەکانی سەر زەوی ببنە قەڵەم و نووک و بەدی گیانداران ببنە نووسەر و بە تەمەنی درێژەوە بنووسن، ئەوەی دەینووسن کایەک لە کێویکیش نییە.

هەروەک گوتی: قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى[1]. بەڵام بە کورتی بزانە کە ئافریندراوەکان دوو کەرتن:

**کەرتێکیان**، مەمانان هیچ زانیارییەکمان لە سەری نییەو ناتوانین بیریان لەسەر کەینەوە، هەروەک گوتی: سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ[2].

ئەوەش زانیارییمان لە سەری هەیە، خۆی دەبێتە دوو پاژ:

**یەکەم** ئەوانەی کە بە چاو نابینرێن، وەکوو عەرش و کورسی و فریشتەکان و دێوو درنجان و شتی وا. ڕامان لەمانەدا دژوارە.

کەواتە ناچار دێینە سەر ئەوانەی کە بە چاو دەبینرێن، وەکوو ئاسمان و خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و زەوی و ئەوەی لە سەریدایە، وەکوو کێو و دەریا و چۆڵ و شار و ئەوەی لە کێوەکاندایە وەکوو کان و گەوهەرەکان و ئەوەی لەسەر زەویدایە لە ڕوەک و ئاژەڵ بێجگە مرۆڤ، تا دەگاتە مرۆڤ. مرۆڤ لە هەمووی ئەمانە سەیرترە؛ هەروەها ئەوانەی لە دوری زەوی و ئاسماندان، وەکوو هەور و باران و

---

١ ـ (قورئان، ١٠٩/١٨) بێژە ئەگەر بۆ نووسینی وتاری پەروەرندەی من دەریا هەموو مەرەکەف بێ، بەر لە دوایی پێ هێنانی وتاری پەروەرندەی من، بێ شک دەریا هەڵدەچۆڕێ. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ٣٦/٣٦) هەر خودا پاک و بێ عەیبە، کە جووتەی هەموو شتێکی وەدی هێنا؛ چ لەوانەی لەم سەرزەمینە دەڕوێن و چ لە خۆیان، چ لەوانەش کە نایزانن. (هـ)

تەرزەو بەفر و هەورەبروسکە و پەلکەزێرینەو ئەو دیاردانەی لە ئاسماندا دێنە دی.

کەواتە بەرچاو هەر ئەمانەن و لە هەریەک لەمانەدا مەودای رامان هەیە، هەموو ئەمانەش دەسکردی سەیری پەروەردگارن؛ کەواتە بە هەندێکیان هێمایەکی کورت دەکەین. هەموو ئەمانەش نیشانەکانی خودان کە فەرموویە تێیاندا رامێنی و بیریان لێ کەیتەوە. هەروەک گوتی: وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ[1] هەروەها فەرمووی: أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ؟[2]، هەروەها: «انَّ فی خَلقِ السَّموات وَالأرض وَاختلاف اللَّیلِ وَالنَّهار لآیات لأُولی الألباب». لەم ئایەتانە گەلێک زۆرن؛ کەواتە بیریان لێ بکەوە:

**نیشانەی یەکەم** کە لە هەمووان لێت نزیکترە، خۆتی و لە تۆ سەیرتر لەسەر زەویدا چێتر نییە، کەچی خۆت لێی بێ ئاگای. پێت دەڵێن کە لە خۆتدا ورد بەوەو رامێنە تا گەورەیی ئێمەت لێ خویان بێ: وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ[3]. واتە: لە خۆتاندا نیشانەگەلێک هەیە، بۆچی رانامێنن؟ کەواتە لە سەرەتای رسکانی خۆت تێفکرە کە لە کوێرا هاتووی؟ سەرەتا دلۆپە ئاوێک بووی و لە پشتی بابتدا و سنگی دایکتدا. لە پزدانی دایک زەوی و لە پشتی باب تووی ئافراند و لەو تووە تۆی رسکاند؛ شاوەتی بەسەر نێر و مێدا داسپارد کە ئەو تووە لەو زەوینەدا بچێنن؛ لە خوێنی مەهک ئاوی ئەو تووەی دا و تۆی لەو دلۆپە ئاوەو خوێنی پیار[4] ئافراند: سەرەتا بوویتە پارچەیەک خوێنی گرساو، پاشان لەتێ گۆشت؛ کە گیانیان تێتدا دەماند؛ پاشان لەو خوێن و ئاوە ساکارە شتی جۆراوجۆرت تێدا هاتە دی، وەکوو پێست و گۆشت و دەمار و ئێسک؛ لەمانەش ئەندامانی تۆی چێ کرد. سەرێکی خڕو دوو دەست و پێی درێژ کە لە سەری هەریەکەیان پێنج قامک هەیە؛ لە دەرەوەی ئەم جەستەیە چاوو گوێ و کەپۆ و ئەندامانی‌تری دانا، لە ناوەوەش گەدەو گورچیلە و جەرگ و سپڵ و زارو پزدان و میزدان و ریخۆڵەی خولقاند، هەریەکیان لە قەوارەو دانستەیەکی تایبەتدا. هەر یەک لەمانەشی کردە چەند پاژ، هەرقامک کرایە سێ بەند و هەر بەشە لە پێست و رەگ و ئێسک پێک هاتووە؛ چاوت، کە بە قەدەر گوێزێک نییە، لە حەوت چین خولقاوە و هەر چین تایبەتمەندییەکی هەیە کە گەر یەکیان بفەوتێ دونیات لێ تاریک دەبێ. گەر بە تەنیا لەسەر سەیر و سەمەرەکانی چاو، بپەیڤین، دەبێ

١ ـ (قورئان، ١٢/١٠٥) چەند زەعفن نیشانەگەل لە عاسمانان و زەمیندا؛ بەلایاندا رادەبرن و گوێی پێ نادەن. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ٧/١٨٥) ئاخۆ ئەوان لە دام و دەزگای پر شکۆی عاسمانەکان و زەمین و هەرچی خوا دروستی کردوون. (هـ)

٣ - (قورئان، ٥١/٢١)

٤ - پیار: خوێنی حەیز (حیض)

کاغەزی زۆر رەش کەینەوە.

سەیری ئێسکی خۆت کەو بزانە چۆن ماکێکی سفت و سەخت لە ئاوێکی نەرم و شل ئافرێندراوە و هەر بەشێکی بیچمێکی هەیە و هەندێکیان خڕو هەندێکیان درێژ و بڕێ پان و تاقمێ بۆش و بەشێکیان ناوپڕن و هەموویان بە تەکووزی و لە جێی خۆیان دانراون و بۆ رادە و بیچم و شێوازی هەر یەک بەردەباری و هۆی زۆر و تایبەت هەیە. ئێسقانی کردۆتە ئەستوونی لەش و هەمووی لەسەر ئەو بنیات ناوە؛ گەر یەک‌دەست و یەک‌جۆر بایەن، پشت قەد نەدەچەمایەوە، گەریش پرژ و بڵاو بایە، دیسان پشتت پێ راست نەدەگیرا و نەتدەتوانی راست راوەستی، بۆیە بڕبڕە خولقاند تابچەمێتەوە، پاشان رەگ و پی و دەمار و ماسوولکەی تێ ئالان تا قایم بێ و خۆ راگرێ. لە سەری هەر مورتخەیەکەوە[1] زیادەیەک وەکوو کاپی دانا، لە ژێریشەوە چوار چاڵی دانا تا ئەو قاپانەی تێدا بنیشن و جێ بگرن. لە تەنشت مورتخەکانەوە پەراسووەکانی دەرهێنا تا دەمارەکانی تێ ئاڵێنێ و پتەو و قایمی کاتەوە. کاسەسەری مرۆڤی لە پەنجاوپێنج بەش ئێسکی جیاواز ئافراند و بەدرزگەلی باریکەوە پێکەوە نووساندنی تا گەر بەشێکی زیانی دی، ئەوانی‌تر بێوەی بن و تێک نەشکن. هەندێ لە دانەکانی پان و سەر ئەستوور خۆلقاند تاکوو خۆراک بهاڕێ و وەکوو ئاش دەور بگێڕێ و هەندێکی تیژ و باریک چێ کرد، تا خۆراکەکان ببڕێ و بیخاتە بەر ئاش؛ ملی لە حەوت مۆرتخە خولقاند و بە رەگ و ماسوولکەی پتەو کردەوە. پشتی لە بیست و چوار بڕبڕە ئافراند و ملی لەسەر دانا؛ ئێسقانی سنگی بە پانەوە بە مۆرانەوە نووساند. ئێسکەکانی‌تریش هەروان و راڤەیان دوورودرێژە. بە گشتی لەشی تۆ دووسەدوچل‌وهەشت پارچە ئێسکی تێدایە و هەریەک بۆ کارێک ئافریندراون تا کارت بۆ پێک بهێنن. هەمووی ئەمانەشی لەو ئاوە بێ‌نرخە رسکاند. گەر یەک لە ئێسقانەکانت کەم بێ، لە کاردا پەکت دەکەوێ و گەریش یەکێکی فرە بێ، تووش دەبی.

چونکە نیازت هەیە ئەم ئێسکانەت ببزوێنی، لە هەموو لەشتدا پانسەدوبیست‌وحەوت ماسوولکەی دانا، هەر یەک لە جۆرێک: هەندێ وەکوو ماسی، ناوقەد پان و سەر باریک، هەندێ گەورەو هەندێ بچووک، هەریەکە پێکهاتووە لە گۆشت و پەی و پەردەیەک کە وەکوو کێلانە. بیست‌وچوار ماسوولکە تەنیا هی ئەوەن تا تۆ بتوانی چاو بە دەوروپشتدا بگێڕی و ئەوانی‌تریش هەر بەم پێیە هەڵسەنگێنە.

لە ئەندامی خۆتدا رامێنە و بزانە هەر ئەندامێکی بۆچی ئافراندووە. چاوی لە حەوت چینداو لە بیچمێکدا کە جوانتر لەوە بۆ کەس نالوێ چێ کردووە. پێڵی بۆ پاکژ کردنەوەی چاو هێناوەتە دی. برژانگەکانی راست و رەش خولقاند تا هەم جوان بێ و هەمیش مەردومی چاو چاتر پێ ببینێ. تاکوو گەر تۆزێک لە هەوادا بوو، چاو بتروکێنێ و تۆزنەگاتە چاوت و گەریش گەیشت پاکژ و خاوێنی

---

[1] - مورتخە: مازەی پشت. بڕبڕەی پشت.

کاتەوە. سەیرتر لە هەمووی ئەمانە کاسەی چاوە کە بەو بچووکیە، هەموو زەوی و ئاسمانی پان و بەرین و بەرفراوانی تێدا بەدی دەکەی؛ تەنانەت لە یەک چاوترووکاندا، زەوی و ئاسمان و ئەوەی لە پێش چاو بێ سەیری دەکەی. گوێی خولقاندو ئاوێکی تاڵی تێدا دانا تا هیچ گیانلەبەرێک نەتوانی تێیدا رۆبچێ و پاشان لەپکەی گوێی چێ کرد تا دەنگەکان کۆوەکاو بە کونی گوێی بگەیێنێ. راڤەی گوێ و دەم و لووت و ئەندامانیتر گەلێک زۆرە و پتر لەمەمان بۆ نابێژرێ.

مەبەستمان لەم باسە ئاوەڵاکردنی ئەم رێگایە بۆ بیرکردنەوەو لە بنج و بناوانی ئەم بەشانە کۆڵینەوەیە کە چین و بۆچی ئافریندراون، لەم رێگەوە شارەزای هێز و گەورەیی و دەسەڵات و زانایی و بەردەباری و بەزەیی و دلۆڤانی پەروەرندەت بی و بزانی سەر تا پێت تەژی لە سەیر و سەمەریەو هەروەها ئەندامانی دەروونت و مێشک و ئاوەزت لە هەموویان سەیرترە، تەنانەت ئەوانەش لە سنگ و ورگتدان هەروان: گەدەی وەکوو تەیانەیەک خولقاند کە بەردەوام قوڵ دەوەشێنێ و خۆراکەکانی تێدا دێنە کوڵ و جەرگ ئەو خۆراکە دەکاتە خوێن و دەمارەکان ئەو خوێنە لە حەوت ئەنامدا بڵاو دەکەنەوە و کیسەی زەرداو کەفی ئەو خوێنە دەگرێ و سپڵ، تفڵی ئەو خوێنە کە سەودای تێدایە دەگرێ و گورچیلە ئاوەکەی دەگرێ و بۆ میزدانی دەنێرێ. هەروەها پزدان و ئەو ئەندامانەی تایبەتی زاوزێن، یا خۆ ئەو هێز و واتایانەی کە لە مرۆڤدا چێ کراون وەکوو بینایی و بیسایی و ئاوەز و فام و... گەلێک سەیرترن.

کەواتە، رامێنە و بزانە کاتێ وێنەکێشێ، وێنەیەکی جوان لەسەر دیوارێک دەکێشێ، سەرت سوور دەمێنێ و ئافەرەمی پێ دەڵێی، کەچی ئەم وستایە دەبینی کە لە دڵۆپە ئاوێک، ئاوەها وێنەیەکی سەیر و سەمەرەی ئافراندووە و لە زانست و تێگەیشتوویی و شارەزایی و دەسەڵاتی ئەم وەستایە رانامێنی و سەرت سوور نامێنێ؟ کاتێ لە پزداندا پێویشت بە خواردن بوو لە رێی ناوکەوە تێری کردی، کە گەورە بووی و لە پزدان هاتیە دەرەوە، ناوکی بەست و دەمتی کردەوە و بە قەدەر نیارت شیری دا بە دایکت کە تێرت کا؛ کاتێ کە جەستەت لاواز و ناسک بوو خۆراکت بۆ قووت نەدەچوو، شیری پێتدا؛ سنگی دایکی خولقاند و لە نێو سنگیدا مەمکی ئافراند و گۆوەی مەمکی بە قەدەر دەمی تۆ چێ کرد و کونێکی بچووکی بۆ دانا تا شیر بە هوژمەوە نەیتە نێو دەمت؛ گازرێکی لە سنگی دایکدا دانا تا ئەو خوێنە سوورە بکاتە شیرێکی سپی و پاک و بێخەوش و پێت بدرێ؛ بەزەییەکی سەیری بەسەر دایکدا داسپارد تا کاتێ منداڵی برسی دەبێ، ئوقرەی نەمێنێ و ئارامی هەڵبگیرێ بۆ تیرکردنی کۆرپەی؛ چونکە خواردنی شیر پێویستی بەدان نییە، لە سەرەتاوە دانی پێت نەدا تا سنگی دایکیش بریندار نەکەی، کاتێ ئەوەندە بە هێز بووی کە خۆراکت پێ بخورێ، لە کاتی خۆیدا ددانی پێ دای تا خۆراکی سفتت پێ بخورێ. جا برا! دڵکوێر ئەو کەسەیە کە ئەم هەمووە دەبینێ و

لەگەورەیی و بەزەیی پەروەردگاریدا رانامێنێ و سەری سوورِ نامێنێ و هۆگری ئەم گەورەییە نابێ. نەزان و نەفام ئەو کەسەیە کە بیر لەمانە ناکاتەوە و ئەو ئاوەزەکە پێی دراوە و هێژاترین خەلاتییە، بە خەسار دەدا و پتر لەوەی کە برسی بێ بخوا و توورە بێ پێسیری خەڵک بگرێ، چیدی نەزانێ و سەیری گوڵستانی دەسکردەکانی خودا نەکا.

هەر ئەمەی بێژرا، بۆ ئاگەدارکردنەوە بەستەو جەستەی تۆ تەژی لەم شتە سەیرانەیەو ئەمەی بێژرا دڵۆپێ لە دەریایەکیش نییە و لەمەدا نەک تۆ، زۆربەی گیانداران لە مێشوولەوە بگرە تا فیل، هەر وەکوو تۆ وان.

**نیشانەی‌تر،** زەوینە و ئەوەی لە سەریدا دانراوە. گەر دەتەوێ لە جەستەی خۆت سەرتر برۆی، سەیری زەوی و ئەوەی لە سەریدا دانراوە بکە، چلۆن بە هەموو لادا پەل‌کێش بووە، بە چەشنێ کە هەرچی دەڕۆی ناگەیتە رۆخی.

کێوەکانی وەکوو پسمار دانا با لە ژێر پێتدا نەلەرزێ و نەجوولێ. لە ژێر بەردگەلی سفت و سەختەوە ئاوی نەرم و پاکی رەوان کرد تا بەرەو زەوی بێ و بە سەریدا بڕوا، گەر ئەم بەردە سفتانە نەبوایەن بە یەکجار لە ژێرەوە دەهاتە سەر و سەری زەوی تژی لە ئاو دەکرد و دونیای نوقم دەکرد. یان بەرلەوەی مێرگ ئاو بخواتەوە، دوایی دەهات. لە وەرزی بەهاردا رامێنە کە دونیا رەنگی مردووی لێ نیشتووە، بەلام کە بارانی بەهار دادەکا، دونیا دەخەملێ و وەکوو ئاوریشمی ئاڵو والا دەڕازێتەوە. لەو روەک و گوڵ و گولالانەدا رامێنە کە چۆن هەر یەک بە رەنگێ سەریان لە خاک دەرێناوەو هەریەک لەویتر جوانتر و بە دەوترە. بیر لە دارەکان و میوەکانیان کەرەوە، بیر لە بۆن و بەرامەو رەنگ و روالەت و تام و چێژیان: یەکێک تفت و یەکێک ترش و یەکێک شرین، یەکیان نەخۆش چا دەکاتەوەو یەکیان چاک نەخۆش دەخا، یەکیان ژیان دەداو یەکیان وەکوو ژار گیان دەسێنێ، یەکیان سەفرا دەبزوێنێ و یەکیان تێکی دەدا، یەکیان سەودا لە دوورترین دەمارەکانەوە دەردێنێ و یەکیان سەودا هەڵدەفڕێنێ، یەکیان گەرمەو یەکیان ساردە، یەکیان شادیهێنەرەو یەکیان خەمهێنەر، یەکیان وشکەو یەکیان نەرم، یەکیان خەو هێنەرەو یەکیان خەورەوێنە، یەکیان خۆراکی مرۆڤەو یەکیان هی ئاژەڵ و مەل و مۆرە. بیری لێ بکەوە و بزانە ئەمە چەن‌هەزارە و لەهەر یەکیاندا چەن‌هەزار شتی سەیر هەیە، تا هێژایی و تەواوی ئەو ئاوەزە ببینی کە هەموو ئاوەزەکان مات و سەرسامین، ئەمەش بێ رادەیەو دوور و درێژە.

نیشانەکانی‌تر ئەو ئەمانەتە بە نرخ و هێژایانەن کە لە ژێر کێوەکاندا حەشار دراون و کانیان پێ دەڵێن: ئەوەی شیاوی خەملاندنە، وەکوو زێڕ و زیو، پیرۆزە و لاڵ و بەدەخشان و یەشم و بلوور و لاژەوەرد و ئاقێق، ئەوەی هاوەنگی لێ چێ دەکەن، وەکوو مس و ئاسن و برنجە. هەندێ کانی‌تر کە

بۆ کارگەلی‌تر دەلوێن، وەکوو خوێ و گۆگرد و نەوت و قیر، کە کەمترینی خوێیە کە تامی خۆراکەکانی پێ‌خۆش دەکرێ و گەر لەو شارێکدا خوێ نەبێ، هەموو خۆراکەکان بە خەسار دەچن و تامیان دەگۆڕێ و خەڵک نەخۆش دەکەون. جا سەیری بەزەیی و دلۆڤانی کە، کە هەرچەند خواردنی پێ داوی، بەڵام چونکە تامی بەشتێکی‌تر خۆش دەبێ، خوێی پێ داوی و لەم چەشنە بەزەییانە زۆر و زەوەندن.

**نیشانەی‌تر** گیاندارگەلێکن کە لەسەر زەویدان و هەندێکیان بە پێ دەڕۆن، هەندێ دەفڕن، هەندێ دەخزن، هەندێ بە دوو پێ دەڕۆن و هەندێ بە چوار پێ و هەندێکیش بە چەندەها پێ. پاشان لە هەموو جۆرە مەل و مۆرێکدا رامێنە، کە هەر یەکیان لە بیچمێکدان و یەک لە یەک جوانتر و تەکووزترن، هەر یەک ئەوەی پێویستیانە پێیان‌دراوە و خستوویەتە دڵیانەوە کە چۆن خۆراکی خۆیان دابین کەن، منداڵی خۆیان رابێنن و هێلانەی خۆیان چێ بکەن. سەیری مێرووڵەکە، لە کاتی خۆیدا خواردنی خۆی کۆوە دەکا، هەرچی گەنم بێ، دەزانی گەر وەک خۆی بیهێڵێتەوە، دەفەوتێ و سپێ لێی دەدا، بۆیە دەیکاتە دوو کەرتەوە؛ هەروەها گژینیژ گەر لەت بکرێ، خراپ دەبێ، بۆیە بە ساغی دەیهێڵێتەوە. سەیری جاڵجاڵۆکە کە چۆن بە پێی یاسای هیندسە خانووەکەی چێ دەکا و لە ئاوی دەمی هەودا دەچنێ و بە دوو سووچی خانیەکدا خۆی هەڵدەواسێ و لە لایەکەوە بۆ لایەکی‌تر دەڕوا و پاشان خۆی هەڵدەسپێرێ لە سووچێکدا و چاوەڕوانی مێشێک دەبێ کە هەڵبفڕێ و ببێتە خۆراکی ئەم. پاشان خۆی دەخاتە سەریا و راوی دەکاو دەست و پێی بە هەودا دەبەستێ تا هەڵنەیێ؛ پاشان ئەم دادەنێ و دەڕواتە سەر وەخت یەکێکی‌تر. سەیری زەردەواڵە کە چۆن خانووەکەی لە چاوەی شەش‌گۆشە چێ دەکا. هێلانەی زەردەواڵە خڕەو گەر چاوەکانی چوار گۆشە بایان، سووچی هێلانەکەی بەتاڵ دەماوە، گەریش بازنەیی بایە، بۆشایی زۆری تێدەکەوت؛ لە هەموو بیچمێکدا، هیچ کامیان وەکوو شەش گۆشە خڕ نییە و بازنەی پێ پڕ ناکرێتەوە؛ ئەمە بە هیندسە ئاشکرا کراوە. خوای دلۆڤان بە بەزەیی خۆی سەرنجێکی وای بەم گیاندارە بچووکە داوە، ئەم شێوازەی خستۆتە دڵیەوە. ئەگەر ئەمانە زمانیان بایە بە چەشنێ سپاسی خوایان دەکرد و بە گەورییی ویدا هەڵیان دەگوت کە هەموو مرۆڤەکان سەریان سووڕ دەما. بەڵام ئەمانە بە زمانی حاڵ شوکرانەبژێری دەکەن، هەر وەک گوتی: وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ[1]. ئەم شتە سەیرانە گەلێک زۆرن. کێ دەوێرێ بڵێ کە ئەم گیاندارانە کە لە سەتان هەزار تێدەپەڕن، خۆیان، خۆیان ئافراندووە و راهێناوە؟ پاک و بێخەوشە ئەو خودایە کە بەم تیشکەوە چاوەکان کوێر دەکا تا نەبینن، دڵەکان خافڵ

---

١ ـ (قورئان، ٤٤/١٧) بەڵام ئێوە پاکانەی ئەوان نابیسن. (هـ)

دەکا تا رانەمێنن؛ بە چاوی سەر ببینن و بە چاوی دڵ پەند نەگرن؛ گوێی ئەمانە توانی ژنەفتنی ئەو دەنگەی کە دەبێ بگاتە گوێی نییە، تا وەکوو چوارپێ، بێجگە لە دەنگێ چیدی نەبیسن و لە زمانی مەلان، کە پیت و وشەی تێدا نییە، تێنەگەن؛ چاویان ئەو شتەی دەبێ ببینرێ پێی نابینرێ. تەنانەت ئەو دێڕانەش کە بە رەنگی رەش لەسەر لاپەڕەی سپی نووسراون، بۆی ناخوێنرێنەوە. ئەم دێڕانەی پەروەردگار -کە نەپیتن و نە رەقەم- بەسەر رواڵەت و دەروونی وردیلەکانی جیهاندا نووسراوە و هیچیان لێ ناگا. هەروەها سەیری خانووی مێرووله کە، سەیری خۆی کەو گوێی بۆ رادێرە کە بە دەنگێکی بەرز و زمانێکی پاراو دەڵێ: ئەی رووناکدڵ! گەر کەسێک لەسەر دیوارێک وێنەیەک بکێشێ سەری رێزگرتن لە ئاست وەستایی و شارەزایی ئەو وێنەکێشەوە دادەنەوێنی، دەسا وەرەو سەیری رەسمکێشی و وێنەکێشی کە: من فرەتر لە مێروولەیەکی بچووک نیم کە پەروەردگار ئافراندوومی، ئەندامەکانمی یەکبەیەک و لە جێی خۆی چێ کردووە. لەسەر و مێشکمدا چەن گەنجینەی داناوە، لە یەکیاندا هێزی تام و چێژ و لە یەکیاندا وزەی بۆنکردن و لە یەکیاندا هازی ژنەوتنی داناوە. لە دەرەوی سەرم چەن چاوی چێ کردووەو لەسەر ئەو چاوانە رەشایی چاو و لە نێو رەشایی مەردومی چاومی داناوە؛ هەروەها دەم و زار -کە شوێنی خواردنە- بۆم ئافراندووە و دەست و پێی بۆم داناوە و لە ناوەوەش شوێنێکی بۆ هەزمی خۆراک بۆ رەچاو کردووم، هەروەها شوێنێک بۆ هاتنە دەرەوەی پیسایی. پاشان جەستەمی چوست و چەلەنگ خولقاندووە؛ ئەندامم لە سێ چین پێک هاتووە و پێکڕا بەستراون. وەکوو خزمەتکار بەرگی رەشی دەبەر کردووم و لەم جیهانەی کە پێت وایە بۆ تۆ تەرخان کراوە، دانراوم و بەسەر نیعمەتەکانی خوادا وەک تۆ دەگەڕێم و بەهرەی لێ دەبەم؛ تەنانەت تۆی تەرخان کردووە کە شەو و رۆژ کار بکەی و زەوی بکێڵی و توو بچێنی و بیدرووی و هەماری کەی و پاشان پەروەردگار لە ژێر خاکەوە بۆنی پێم بگەینێ و رێم پێ بنوێنێ و لە هەماری دەغڵ و دانتەوە سەردەردێنم و خۆراکی یەک ساڵەم کۆوە دەکەم. زۆر جار هەیە تۆ هەر چی هان دەدەی خۆراکی یەک ساڵی خۆت بۆت پێک نایە، کەچی من لە ماڵی تۆ، لە دەسڕەنج و دەغڵ و دانی تۆ، خواردنی یەک ساڵەی خۆم و بنەماڵەم تەیاردەکەم. پاشان خواردنەکەم لە سارادا لەبەر هەتاو رادەنێم. بەر لە باران خوا ئاگەدارم دەکاتەوەو دەیخاتە دڵمەوە کە بارانە و خۆم و دەغڵ و دانم کۆوە دەکەم، کەچی تۆ تا باران دانەداو رەنجت بە خەسار نەدا، بە خۆت نازانی.

دەسا چۆن سپاسی خودا نەکەم کە منی بچووک و وردی بەم جوانیە ئافراندووەو زەلامێکی وەکوو تۆی بۆم تەرخان کردووە، کە دەغڵم بۆ دەچێنی، دەیدرووی، رەنج دەکێشی و کۆی دەکەیتەوەو هەماری دەکەی و لە ئەنجامدا من دەیخۆم.

هیچ گیاندارێک لە ئاژەڵ و روەک نییە کە بەم چەشنە بە زمانی حاڵ نەدوێ و سپاسی خوا نەکا،

تەنانەت هیچ وردیلەیەک لە عالەمدا نییە کە خەریکی پەسن و سپاس و شوکرانەبژێری پەروەردگاری نەبێ، کەچی مرۆڤ لەمانە بێ ئاگان، بۆیە پێیان دەڵێن: إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ[1]، وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ[2]. ئەمەش بۆ خۆی دونیایەکی پڕ لە سەیر و سەمەرەیە، چۆن راڤە دەکرێ؟

**نیشانەی‌تر دەریاکانن** کە لەسەر زەویدان و هەر یەکەیان بەشێکە و دەریایەی کە لە دەوری زەویدایەو هەموو وشکاییەکان وەکوو جزیرەیەک لە گەمارۆی دەریادان. لە خەبەردا هاتووە کە زەوی لە هەمبەر زەریاکاندا، وەکوو گەوڕێکە لە هەمبەر زەویدا. کەواتە پاش ئەوەی لە سەیری ئافرێندراوە سەیرەکانی وشکایی بوویتەوە، لە دەریادا رامێنە؛ چونکە هەروەک زەریا گەورەترە، بێ‌شک سەیر و سەمەرەکانیشی زۆرترە. هەر گیاندارێک کە لەسەر زەویدا دەژی، وێنەکەشی لە نێو زەریادایە و تەنانەت زۆر گیانداری‌تر هەیە کە لە زەریادا هەیە و لە وشکاییدا نییە؛ هەریەک لەمانە لە بیچم و تەرح و سروشتێکی تایبەت بە خۆدا رسکاون: یەکیان ئەوەندە گچکەیە کە چاو نایبینێ، یەک ئەوەندە گەورەیە کە گەر کەسێک سواری پشتی بێ، وا دەزانێ لەسەر کێوێکە، بۆیە لەسەر پشتی رەنگە ئاور کەنەوەو لەبەر ئاورەکە بە خەبەر بێتەوە و بجووڵێتەوەو ئەوسا بزانن کە گیاندارێکە. لەسەر سەیر و سەمەرەکانی زەریا زۆر نووسراوەو کەی لێرەدا هەموو ئەوانە دێنە گوتن؟ لە بنی زەریادا گیاندارێ دەژی کە سەدەفی پێ دەڵێن، سەدەف پێستی ئەو گیاندارەیە و خوا دەیخاتە دڵیەوە کە لە کاتی بارانی بەهاریدا بڕواتە بەستێنێ زەریا و پێستی کاتەوە تا دڵۆپە باران -کە ئاوی خۆشە، نە وەکوو ئاوی زەریاکە سوێرە - بڕواتە ناویەوەو پاشان پێستی هەڵپێکێتەوە و دیسان بڕواتەوە بنی زەریا و ئەو دڵۆپانە لە دڵی خۆیدا بپارێزێ، هەر وەکوو دڵۆپی ئاو لە پزداندا و لە ناو خۆیدا رایدێنێ و پەروەردەی دەکا؛ پەروەردگار گەوهەری ئەو سەدەفەی لەسەر مرواری ئافراندووە و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ ئەو دڵۆپەی دەداتێ تا بیکاتە مروارید و هەندێکیان گەورەن و هەندێ گچکەن، تا تۆ لەوانە خشڵ و رەوش و زەنبەر چێ کەی. هەروەها لە بنە زەریادا روەکێ لە بەرد دەروێنێ بە رەنگی سوور، کە رواڵەتی روەکی هەیە و گەوهەری بەردە و مەرجانی پێ دەڵێن. لە کەفی ئەم مەرجانە جەوهەرێ دەگاتە بەستێنی زەریا کە عەمبەری ناوە.

گەمیەوانی لەسەر زەریا و جۆری چێ‌کردنی گەمیە کە لە ئاودا نوقم نەبێ و هەروەها شارەزایی

---

١ - (قورئان، ٢١٢/٢٦) دیارە ئەوان لە بیستن بێ‌بەش کراوان. (هـ)

٢ - (قورئان، ٤٤/١٧) هەموو شتێک ـ بە پەسن دانەوەـ پاکانەی ئەو دەکا؛ بەلام ئێوە پاکانەی ئەوان نابیسن. (هـ)

گەمیەوان کە بای راست لە ناڕاست بناسێ و ئافراندنی ئەستێرە کە لەو شوێنەدا هیچ دیاردەیەک نامێنێ، ڕێنومایی کا، لە هەمووی ئەوانە سەیرترە. هەروەها خولقاندنی ئاو لەم بیچمە دا و لەم یەکگرتوویی و نەرمیەدا و لەوەدا کە ژیانی هەموو گیاندارێک بەوەوە بەندیوارە، لەوانە سەیرتر؛ چونکە کاتێ پێویستت بە جامێ ئاو بێ و نەتبێ و هەموو دونیاهی تۆ بێ، بێ سێ و دوو هەر چیت هەیە دەیدەی تا لە تینوێتی رزگارت بێ. هەروەها گەر ئەو ئاوە کە خواردووتەوە لە دەروونتدا قەتیس بمێنێ و ڕێێ هاتنە دەری نەبێ، هەموو دونیا دەدەی تا لێی رزگار بی. بە کورتی سەیر و سەمەرەی ئاو و زەریاش زۆر و زەوەندە و لەم چەن دێڕەدا ناگونجێ.

**نیشانەی‌تر، هەوا و ئەوەی تێدایە،** چونکە هەواش زەریایەکە کە شەپۆل دەوەشنێ و با، شەپۆلی تەنێک بەم نەرمییە کە چاو تیێ ناگا و نابێتە پەردە لەبەر چاو و بۆ خۆی بەردەوام خۆراکی گیانی تۆیە؛ چونکە خۆراک و ئاو رۆژێ چەن جار دەخورێن، کەچی هەڵمژینی هەوا بەردەوامەو گەر مەودای تێکەوێ، گیان لە لەش باردەکا و مردنی لە جێ دەنیشێ، کەچی خۆتیش پیێ نازانی. یەک لە دانستەکانی هەوا ئەوەیە کە گەمیەکان رادەگرێ و ناهێڵێ لە ئاودا رۆبچن و راڤەی ئەمەش دوور و درێژە. سەیر کە لەم هەوایەدا چ خولقاوە لە هەور و باران و بەفر و برووسکە. سەیر کە ئەو هەورەی رەشە چۆن لەو هەوا نەرم و پاکژەدا دێتە دی و رەنگە هەڵمی ئاوی زەریاکان یان هەڵمی ئاوی کۆساران یا خۆ هی خودی هەوا بێ و هاتبێتە دی؛ ئەم هەورە ئاوسە دەباتە ئەو شوێنانەی ئاویان پێ ناگاو دڵۆپ دڵۆپ بە سەریاندا دایدەبارێنێ و هەر دڵۆپێک لەسەر هێڵێکی راست دێتە خوارەوە و لە ئەزەڵەوە شوێنی دابارینی رەچاو کراوە، تاکوو فلان کرم کە لەو شوێنەدایەو تینوویە، تێر ئاو بخواتەوە و فلان رووەک با وشک نەبێ و تەڕ بێتەوە و فلان توو نیازی بە ئاوە تا شین بێ و فلان میوە لەسەر دار وشک نەبێتەوە با بنی ئەو دارەش تەڕ بێتەوە و لەوێڕا لە بنی ئەو دارەدا رۆبچێ و لە ئەندامانی هەڵزنێ و خۆی بگەیێنێتە بەری ئەودارەو تێرئاوی کا، کە تۆ بیخۆی، هەرچەن لە رادەی بەزەیی و دلۆڤانی پەروەرندەشت بێ ئاگا بی؛ لەسەر هەر دڵۆپێک نووسراوە کە کوێڕا بێتە خوار و ببێتە بەش و نسیبی کێ. لەسەر ڕێی گەواڵە هەوردا سەرمای داناوە تا بەفر دابارێنێ، بەفر وەکوو پەمۆ دابارێ و لەسەر کێوەکاندا جێ بگرێ و پاش ئەوەی بەهار دێ و تینی هەتاو پتر دەبێ، بەرەبەرە دەیکاتە ئاوو لە شاخانەوە بەرەو خوار خوڕ دەبێ و رووەک و گیاندارانی سەر ڕێ تێر ئاو دەکاو بەرە بەرە تا بارینی بارانی پائیز ئاویان پێ دەدا.

دەسا بزانە گەر ئەم بارانەی بە یەکجار و بە خوڕ داباراندایە، نە گیانداران تێر ئاو دەبوون، نە بۆ ساڵەکەیان ئاو دەمایەوە. لە بەفردا بەزەیی و میهرەبانی زۆر هەیە، لە راستیدا لە هەموو شتی ئەم

جیهانەدا شارەزایی و لێزانی و دلۆڤانی شراوەیە و هەموو شتێ بە داد و عەدڵ خولقاوە، بۆیە گوتی: وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ[1] بۆ یاری و جەفەنگ نەمانخولقاندووە، بە حەق ئافراندمان، واتە هەر شت بە چەشنێ خولقاوە کە دەبوایە بخولقایە.

**نیشانەی‌تر مەلەکووتی ئاسمان و ئەستێرەکان.** و سەیر و سەمەرەکانی ئەوانەیە؛ لە راستیدا زەوی و ئەوەی تێیدایە زۆر کوڵ و کورتە. قورئان هەمووی دنەدەرێکە بۆ ئەوەی لە ئاسمان و ئەستێراندا رامێنی، هەروەک گوتی: وَجَعَلْنَا فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ[2] هەروەها گوتی: لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ[3].

کەواتە، ئەمرت لێ کراوە کە لە سەیر و سەمەرەکانی مەلەکووتی ئاسماندا رامێنی و بیری لێ بکەیتەوە و لێی وردبیتەوە، نەک بە تەنیا سەرهەڵبڕی و سەیریان کەی، چونکە ئاژەڵیش ئەم کارەیان پێ دەکرێ. بەڵام تۆ کە خۆت و شتە سەیرەکان کە لە هەموو شت لێت نزیکترن، نەناسی، تۆ کە لە ئاست ئاسماندا تۆزکالێکیش نیت و خۆت نەناسی، چۆن مەلەکووتی ئاسمانت پێ دەناسرێ؟ دەبێ بەرەبەرە سەرکەوی: سەرەتا خۆت بناسە، پاشان زەوی و روەک و ئاژەڵ و کانەکان، پاشان هەواو هەور و دانستەکانیان، ئینجا ئاسمانەکان، دواتر کورسی و عەرش، دوای ئەمانە لە جیهانی تەنەکان بڕۆرە دەرەوەو بڕۆرە نێو جیهانی گیانان؛ ئەوسا مەلائیکەو شەیتان و جین و ئاست و رادەی فریشتەکان دەناسی. کەواتە دەبێ لە ئاسمان و ئەستێران و سووڕان و گەڕانیان بە رۆژهەڵات و رۆژاوایاندا رامێنی و بزانی ئەوە چییە و بۆ چییە. لە ئەستێراندا رامێنە کە لە ژماردن نایەن و هەر یەک لە رەنگێکن، یەک سپی و یەک سوور و یەکیش زیوی، یەک گەلێک بچووک، یەکیش زۆر گەورە؛ هەر تاقمێ وێنەیەک پێک دێنن، یەک وەکوو کاژیلە، یەک وەکوو مانگا، یەکێ وەک دوو پشک، تەنانەت هەر وێنەیەک کە لەسەر زەویدایە، تۆ لە نێو ئەستێراندا هاوتایەکی بۆ دەبینیەوە.

ئەو دەم سەیری گەڕانیان کە، هەندێکیان بە یەک مانگ ئاسمان دەپێون، هەندێ بە یەک ساڵ، برێ بە دوازدەساڵ و زۆرترنییان ئەوەیەکە بە سی‌وشەش هەزارساڵ ئاسمان دەپێوێ، گەر فەلەک

---

١ ـ (قورئان، ٣٨/٤٤ـ٣٩).

٢ ـ قورئان (٣١/٢١) لەسەرزەویش کەژوکۆمان وەدی هینا، نەوەکا وەیان لەرزێنێ و چەند رێبازمان لێ پێک هینا بەڵکوو ئەوان شارەزا بن. (هـ)

٣ ـ قورئان (٥٧/٤٠) داهێنانی ئەم عاسمانان و زەمینە، لە وەدی‌هێنانی مەردم گرینگترە. (هـ)

بمێنێ و پەسڵان رانەگا. شتی سەیری ئەم زانستە لە ژماردن نایە. کە زەویت ناسی، دەبێ بزانی جیاوازی زەوی و ئەستێرانیتر بە بۆنەی جیاوازی لە بیچمیانە، زەوی بەم گەورەیییە، کە کەس بە تەواوی لیێ ناگا، سەدوشەست و چەنجار لە هەتاو بچووکترە، بەڵام چونکە زۆر لێکتر دوورن، وا گچکە دیارن. کە ئەستێرە وابوون، جا خۆت بزانە کە فەلەک چەن گەورەیەو ئەو ئەستێرانەی کە زۆر لە زەوی گەورەترن و کەچی ئەوەندە بچووک دیارن، بۆ ئەوەیە تێفکری و گەورەیی پەروەرندەت لێ خویان بێ. لەهەر ئەستێرەیەکدا ژیرییەک و هۆزانیەک هەیە، لە رەنگیدا، لە هاتن و رۆیشتنیدا، لە هەڵاتن و ئاوابوونیدا بەردەبارییەک هەیە. ئەوەی کە لێمان روونترە، هەتاوە، تا لە ماوەیەک لە ساڵدا لە دوری سەر نزیک کەوێ و ماوەیەک دوور کەوێ، تا هەوا بگۆڕێ: هەندێ جار سارد و برێ جار گەرم و جاربەجاریش ناونجی. لەم سۆنگەوە شەووڕۆژ جیاوازن: هەندێ جار درێژتر یان کورتترن. گەر چۆنییەتی ئەمە راڤەکەین، باسەکەمان زۆر دەخایەنێ. ئەوەی پەروەردگار لەم زانستانە بەشمانی داوەو لێمانی ئاشکرا کردووە، گەر بمانەوێ هەمووی بلێینەوە، رۆژگارێکی زۆر دەخایەنێ.

ئەوەش ئێمە دەیزانین لە ئاست سەرجەمی زانایان، گەلێک کەم و بێنرخە. زانستی هەموو زاناو ئەولیاش لە ئاست پێغەمبەراندا هەر هیچ نییە؛ زانیاری پێغەمبەرانیش لە هەمبەر فریشتەکانی نزیکی خواوە، گەلێک گچکەیە؛ هەموو ئەم زانستانە و ئەوانەی پێشووش گەر پێکڕا کۆیان کەیتەوە، لە چاو زانستی خوادا شیاوی ئەوە نین ناوی زانستیان لەسەر بنرێ. پاک و بێخەوشە ئەو خودایە کە چەنای چەن زانستی دا بە خەڵکی و پاشان داخی نەزانی لەسەر توێڵ نان و گوتی: وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلاً[1].

ئەوی بێژرا مشتێ بوو لە هەشتێ لەمەڕ شێوازی بیرکردنەوە، تا نەزانی خۆتت لێ خویان بێ، چونکە کاتێ دەڕۆیتە نێو خانووی خونکارێکەوە کە خانیەکەی بە گەچ سواخداوە و رەنگ و وێنەی جوانی لەسەر کێشاوە، ماوەیەک هەر پەسنی ئەو جوانیە دەکەی و سەرت سووڕ دەمێنێ، کەچی هەموو رۆژێ ئەم وێنە جوانانەی کە پەروەرندەت بۆتی کێشاوە، دەبینی و سەرت سووڕ نامێنێ. ئەم جیهانە بێ سەروبنەی ئاڵووالا، خانووی خودایە، رایەخی زەوینە و سرمیچی ئاسمانە، بەڵام سرمیچێکی بێ کۆڵەکە، ئەمە خۆ زۆر سەیرترە. خەزانەی ئەو، کێوەکانە و گەنجەکانی زەریاکانن، کەلوپەلی نێو ماڵی ئاژەڵ و روەکەکانن، چراکەی مانگەو مەشخەڵی هەتاوە و قەندیلەکانی ئەستێرەکانن و مەشخەڵدارەکانی فریشتەکانن، کەچی تۆ لەم حەمگە سەیر و سەمەرەیە بێ ئاگای، چونکە خانووەکەی ئێجگار گەورەیە و چاوی تۆش تەواو بچووکە و ئەمانەی تێدا ناگونجێ. تۆ وەکوو

---

[1] ـ قورئان (۸۵/۱۷) ئێوە کەمێکتان لە زانست پێدراوە. (هـ)

مێروولەیەکی کە لە کونجی کۆشکی پادشایەکدا خانووی هەیە و چونکە زۆر گچکەیە، لەو هەموو کۆشک و بینا گەورەو ئاڵ و والایە بێجگە لە کونی هێلانەکەی و شتی وردی دەور و پشتی چیدی نابینیّ و نایزانیّ. گەر پێت خۆشە لە هەمان ئاستی مێروولەدا بمێنیەوە، کەیفی خۆتە، ئەگینا ڕێت پیّ دراوە تا سەیری باخ و بێستانی پەروەرندەت کەی و بیتە دەرەوەو چاوت کەیتەوە و سەیر و سەمەرەکان ببینی و مات و حەیران بی. وەسسەلام.

## بنەمای هەشتەم - تاکپەرستی و پشتبەستن

بزانە، پشتبەستن، مەقامی نزیکان بە خودایەو ئاستێکی زۆر بەرزی هەیە. بەڵام ئەو زانستە لە خۆیدا زۆر ئەستەم و باریکە و کار پێکردنی زۆر دژوارە. کێشەی ئەمە لەوەدایە کە هەرکەس شتێکی‌تر بێجگە لە خوا خاوەن کاریگەری ببینێ، لە تاکپەرستیدا تووشی کەمایەسی هاتووەو گەر سەرلەبەری هۆکارەکانیش لا ببا، تیزی لە شەریعەت گرتووە و گەریش بۆ هۆوەکان هۆکارێ نەبینێ، خۆی تووشی شەڕی ئاوەز کردووە، کە ئەو هۆکارەی بینی، رەنگە پشت بە یەک لەو هۆکارانە ببەستێ و تاکپەرستیەکەی تووشی زیان بێ. کەواتە شرۆڤەی پشتبەستن، بە چەشنێ کە ئاوەز و شەرع و تاکپەرستی پێکڕا بلێ و کۆیان کاتەوە، زانستێکی ئاستەم و ئاڵۆزە و هەرکەس تێی ناگا. ئێمە سەرەتا هێژایی پشتبەستن باس دەکەین، پاشان راستەقینەی، دواتر بارودۆخ و کردەوەکانی.

### هێژایی پشتبەستن

پەروەردگار بە هەمووانی فەرموو کە پشتی پێ ببەستن و ئەوەیە کردە مەرجی بڕواداری و گوتی: وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم [1] مُّؤۡمِنِينَ. دیسان گوتی: إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ [2] ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ. دیسان فەرمووی: وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ [3] حَسۡبُهُۥٓ. هەروەها: أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ [4] عَبۡدَهُۥ. لەم ئایەتانە زۆروزەوەندن.

پەیغەمبەر فەرمووی: «ئوممەتانیان پێم پیشان دا، ئوممەتی خۆم دی کە چۆڵ و دەشت هەڵینەدەگرتن، زۆر شادبووم بەوەی کە زۆرن. پێیان گوتم: "شاد بوویتەوە؟" گوتم: "ئەرێ". گوتیان:

---

١ ـ قورئان (٢٣/٥) ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خودا هەیە، خۆتان بە خودا بسپێرن. (هـ)

٢ ـ قورئان (١٥٩/٣) خودا ئەوانەی خۆش دەوێ کە خۆیان هەر بەو دەسپێرن. (هـ)

٣ ـ قورئان (٣/٦٥) هەرکێ خۆی بە خوا بسپێرێ، ئەوی بەسە. (هـ)

٤ ـ قورئان (٣٦/٣٩) تۆ بەوانەی غەیرەز خودان، دەئ

"دەگەڵ ئەم حەفتاهەزارە بە بێ لێپرسینەوە دەڕۆنەوە نێو بەهەشتەوە". گوتیان: "ئەوان کێن؟" گوتی: «ئەوانەن کە کارەکانیان لەسەر فاڵ و سیحر و ڕەممالی بنیات نانن و بێجگە لە خوا بە کەسی‌تر بڕوا ناکەن و پشت نابەستن"». عوکاشە هەستاو گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! بۆم دوعا کە با بڕۆمە ریزی ئەوانە». گوتی: «خوایا! لە ریزی ئەو کەسانەدا داینێ». یەکێک‌تر هەستاو گوتی بۆ منیش دۆعا کە. فەرمووی: «سَبَقَکَ بِهَا عُکاشه»؛ عوکاشە پێشی لێ گرتن.

پێغەمبەر فەرمووی: «ئەگەر بەو جۆرە شیاوی پشت‌بەستنە، پشتتان بە خودا ببەستایە، پەروەردگار ڕۆزیتانی پێ دەگەیاندن، هەروەک چۆن بە مەلانی دەگەینێ؛ کاتێ بەیانیان بە زگی خالیەوە لە ماڵ دەڕۆنە دەر، ئێوارێ بەزگی تێر و پڕەوە دەگەڕێنەوە». دیسان گوتی: «هەرکەس هانا دەبەر خودا ببا، پەروەردگاری مەزن بژیوی ژینی بۆ دابین دەکاو لە شوێنێکەوە کە چاوەڕوانی لێ ناکا، ڕۆزی بۆ دەگەینێ؛ هەرکەسیش هانا بباتە بەر دونیا، پەروەردگار دەگەڵ دونیای دێڵێتەوە».

کاتێ خەلیلیان گرت کە بە مەنجەنیق لە ئاوری باوێژن، گوتی: «حَسبِیَ اللهُ وَ نِعمَ الوکیل[1]». کاتێ لە هەوادا بوو جوبرەییل پێی گوت: «هیچ کارت هەیە؟» گوتی: «نە». ویستی تاقی کاتەوە و بزانێ لەسەر گفتی خۆی هەیە کە گوتی «حَسبِیَ اللّه». بۆیە لەم سۆنگەوە بە ئەمەگدار ناویان برد و گوتی: وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي [2]وَفَّىٰٓ.

وەحی هاتە سەر داوود کە: «ئەی داوود! لە نێوان بەندەکانمدا کەس نییە کە هانام پێ ببا و هەموو زەوی و ئاسمان بە فێڵ و گزی بەرەنگاری بن و لێی دەربازی نەکەین».

«سعید بن جبیر» دەڵێ: «دووپشکێک پێوە دام، دایکم سوێندی دام کە دەستت پیشان بدە با ئەفسوونێکی بۆ بکەن. لەبەر دڵی دایکم ئەو دەستەی کە سەلامەت بوو پیشانی ئەفسوونگەرم دا». بۆیە ئەم کارەی کرد، چونکە پێغەمبەر گوتبووی پشتی بە خودا نەبەستووە ئەو کەسەی کە ئەفسوون و داخ کا. ئیبراهیمی ئەدهەم گوتی: «لە ڕەبەنێکم پرسی خواردن لە کوێ دابین دەکەی؟ گوتی: لەوەی پرسە کە ڕۆزی دەدا، بزانە لە کوێرا دەینێرێ؟ چونکە من هیچی لێ نازانم». بە یەکێکیان گوت -کە هەمیشە خەریکی عیبادەت بوو- لە کوێڕا دەخۆی؟ ئاماژەی بە دەمودانی کرد و گوتی: «ئەوەی ئەم ئاشەی چێ کرد، باریشی بۆ دەنێرێ». هیرەم کوڕی حەییان لە وەیسی قەرەنی پرسی: «لە کوێ دەڵێی تا بار بخەین». گوتی: «لە شام». گوتی: «بژیوی ئەوێ چۆنە؟» گوتی: «مخابن لەم دڵانە! دڕدۆنگی بە سەریاند زاڵ بووە، پەند وەرناگرن».

---

١ ـ خودامان بۆ بەستە و هەر ئەو یاریدەر و سەرپەرشتە.

٢ ـ (قورئان، ٣٧/٥٣) یان ئیبراهیم، کە ئەرکی خۆی بەتەواوی بەجێ هێنا؟. (هـ)

**راستەقینەی تاکپەرستی کە پشتبەستنی لەسەر بنیات نراوە**

بزانە پشتبەستن دۆخێکە لە دۆخەکانی دڵ و بەرهەمی بڕوایە و باوەڕ بەرهەمی زۆری هەیە. پشتبەستن بناغەی لەسەر دوو باوەڕە. یەکیان باوەڕ بە تاکپەرستی و ئەویتر باوەڕ بە بەزەیی و دلۆڤانی پەروەردگار. شرۆڤەی تاکپەرستی دوورو درێژە و دوایی بۆ نییە، بەڵام ئێمە بەو رادەی کە بنەمای پشتبەستن بێ، ئاماژەی پێ دەکەین.

دەبێ بزانی تاکپەرستی چوار ئاستی هەیە: کاکڵەیەکی هەیە و ئەوکاکڵەش کاکڵەیەکیتر، پێستێکی هەیە و ئەو پێستەش پێستێکیتر؛ کەواتە دوو کاکڵەی هەیە و دوو پێست. ئەمە وەکوو کەمکۆڵە، کە دوو پێستی هەیە و دوو کاکڵە و رۆنەکەشی کاکڵەی کاکڵەکەیە.

**ئاستی یەکەم** ئەوەیە کە بەزار لا اله الا الله بڵێت و بە دڵ بڕوای پێ نەبێ. ئەمە تاکپەرستی دوڕازانە.

**ئاستی دووەم** ئەوەیە کە بە پێڕەوی لە کەسانیتر، وەکوو خەڵکی رەمەکی، بە دڵ باوەڕی بەم واتایە هەیە؛ یان وەکوو زانای کەلامەوان، بە هۆی بەڵگەوە بڕوای پێ هەیە.

**ئاستی سێیەم** ئەوەیە کە بە دیتن دەبینێ کە هەموو شتێ لە یەک بناوانەوە هەڵدەقوڵێ و بەدیهێنەر هەر یەک کەسەو کەس ئامبازی نییە لە ئافراندندا. ئەم رووناکیەکە کە لە دڵدا پێ دەبێ و لە هەمبەر ئەم تیشکەوە ئەم شتانە دەبینرێن. ئەم جۆرە لە باوەڕ، وەکوو باوەڕی خەڵکی رەمەکی، یان کەلامەوانان نییە، باوەڕی ئەوان داوێکە کە بە هۆی لاسایی یاخۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر دڵدا تەنراوە. جیاوازی هەیە لە نێوان ئەو کەسەیدا کە بە پێی وتەی خەڵکی -بۆ نموونە- دایک و بابی کەسێ گوتوویانە فلان ئاغا لەماڵە، ئەمیش بە گوێرەی وتەی ئەوان دەڵێ هەروایەو لە ماڵە: ئەمە تاکپەرستی خەڵکی رەمەکییە؛ یان ئەو کەسەی دەڵێ چونکە ئەسپ و خولامی ئاغە لەبەر دەرکە راوەستاون، ئاغە لە ماڵە؛ ئەمەش تاکپەرستی کەلامەوانانە. یان دەگەڵ ئەو کەسەی کە بە چاوی خۆی ئاغای لە ماڵ دیوە و ئەمەش تاکپەرستی عارفانە. ئەم تاکپەرستیە هەرچەند ئاستێکی بەرزی هەیە، بەڵام هەم خەڵکی تێدا دەبینێ و هەم خودای خەڵک و دەزانێ کە خەڵک لە خوایە؛ بەم پێیە لەمەدا فراوانی هەیە و تا دوو ببینێ، نەبۆتە یەک و لە جیاییدایە.

**ئاستی چوارەم**، سەرترین و تەواوترین ئاستی تاکپەرستیە کە بێجگە لە یەککەس، کەسیتر نەبینێ و هەموو بە یەک بزانێ و یەک بناسێ و جیایی رێی تێ نەبا و ئەم ئاستە لە لای سۆفییاندا توانەوە لە تاکپەرستی پێ دەڵێن. هەروەک حسەینیحەللاج کە خەوواسی[1] لە چۆڵدا دی کە پیاسەی دەکرد،

[1] - خەوواس: مەبەست ئیبراهیمی خەوواس (خواص: زەمبیلچن) لە خواناسانی سەدەی سێیەمی کۆچییە. خەڵکی مازەندەران بووە و لە بەغدادا گەشەی کردووە و پێگەیشتووە. (وەرگێر).

گوتی: «چ دەکەی؟» گوتی: «خۆم لە پشتبەستندا پتەو و قایم دەکەم». گوتی: «تەمەنت لە ئاوەدان کردنەوەی دەروونتدا فەوتاند، دەی توانەوە لە تاکپەرستیدا کوانێ؟»[1]

کەواتە بوو بەم چوار ئاستە:

**یەک تاکپەرستی** دوڕازان و ئەوەش پێستی پێستە. وەکوو توێکلی کەمکۆڵ: گەر بێخۆی، ناخۆشە، سەیری ناوەوەی کەی، کرێتە هەر چەن روالەتی کەسک و جوانە. گەر بیسووتێنی، دووکەڵ دەکا و ئاور دەکوژێنێتەوە، گەریش لە ماڵدا کۆی کەیتەوە، کەلکی نییە و جێگات پێ تەنگ دەکا، هیچ قازانجت پێ ناگەینێ مەگین ئەوەی کە چەن رۆژێ بیهێڵیتەوە تا توێکلی ناوەوە تازە رابگرێ و لە زیانی بپارێزێ. تاکپەرستی دوڕازیش هیچ کەلکی نییە، بێجگە لەوەی کە پێستی لە شمشێر دەپارێزێ و پێستی هەمان جەستەیە و لەم سۆنگەوە خۆی لە شیر دەپارێزێ.

**دووەم**، کە توێکڵ نەماو گیان مایەوە، ئەو تاکپەرستیە هیچ کەلکی نییە. هەروەکوو پێستی ناوەوەی گوێز کە بە کەلکی سووتان دێ و دەکرێ لەگەڵ کاکڵەی دابێنن تا کاکڵە لەو خانییەدا بحەسێتەوە و لە ئافەت و زیان بە دوور بێ، هەرچەند ئەم پێستەش لە چاو کاکڵەدا نرخێکی وای نییە. تاکپەرستی خەڵکی رەمەکی و کەلام زان بۆ ئەوە دەشێ کە مەژگەکەیان - کە هەمان گیانیانە - لە ئاوری دۆژەەبپارێزێ. هەرچەن ئەم کارەی پێ دەکرێ، بەڵام لە نەرمی و ناسکی کاکڵەو رۆنەکەی بێبەشە؛ هەروەها مەبەست کاکڵەیە کە بە نرخە، بەڵام گەر مەبەستمان رۆن بێ، ئەو کاکڵە خۆی دەبێتە زربەو لە خۆیدا بە تەواوی پێنەگەیشتووە.

**ئاستی سێیەم** لە تاکپەرستیدا، ئەمەش لە فراوانی و جیایی و یەکنەگرتوویی نەڕەستووە.

بەڵام پاکژترین و بێخەوشترین ئاست، **چوارەمینیانە**، کە تەنیا خودا دەمێنێ و هیچی‌تر. بێجگە لە ئەو کەس نابینێ و تەنانەت خۆیشی لە بیر دەکاو لە ئاست خۆیدا. نامێنێ و دەتوێتەوە، هەر وەک چۆن شتەکانی‌تری لە چاودا نامێنن و هەموو شتێ لە پێش چاوی دەبێتە ئەو.

---

[1] - نووسەری «کشف‌المحجوب» بەم چەشنە ئەم سەربهوردە دەگێڕێتەوە: دەگێڕنەوە کە حسەین کوڕی مەنسوور لە کووفەدا لە ماڵی محەممەد کوڕی حسەینی عەلەویدا نیشتەجێ بوو. ئیبراهیمی خەوواس هاتبووە نێو کووفەو کە هەواڵی حەللاجی بیست، رۆیشت بۆ سەردانی. حسەین گوتی: ئەی ئیبراهیم لەم چل‌ساڵەکە لەم رێبازەدا خەریکی کۆشەوەی چت پێ گەیشتووە؟ گوتی: رێچکەی پشتبەستنم بۆ مسۆگەر بووە. حسەین گوتی: تەمەنت بۆ ئاوەدان کردنەوەی دەروون تەرخان کرد و فەوتاندت، دەی توانەوە لە تاکپەرستیدا کوانێ؟ واتە پشتبەستن عیبادەتێکە لە پێوەندی نێوان تاک لە گەڵ خوداوەند و دروستکردنی متمانە بە پەروەردگار؛ گەر کەسێک سەرلەبەری تەمەنی خەریکی دەرمانی دەروونی بێ، دەبێ تەمەنێکی‌تری پێ بدرێتەوە تا ئەم دەرمانەی پیشان بداو ئاسەوارەکانی بنوێنێ. جا بەم پێیە دوو تەمەن تەرخان کراوە و کەچی هێشتا کاریگەرییەکی لە خوداوە وەرنەگرتووە. (کشف‌المحجوب، لاپەڕەی ٢٨٩). (وەرگێڕ)

**سەرنج**

ڕەنگە بڵێی تێگەیشتن لەم ئاستانە پێم گرانە و چۆن دەتوانم هەموو کارێک لە یەک کەسەوە ببینم؟ لە کاتێکدا کە هۆکاری زۆر دەبینم، چۆن هەموویان بە یەک بزانم؟ لە کاتێکدا زەوی و ئاسمان و خەڵک دەبینیٚ و ئەمانەش خۆ یەک شت نین.

بێشک تاکپەرستی دوڕاز -کە بە زمانە- و هی ڕەمەکی -کە بە لاسایی کردنەوەیە- و هی کەلام زان -کە بە گوێرەی بەڵگەیە- فام دەکەی، کێشەت لەم تاکپەرستیە دواییەنەیە.

تاکپەرستی چوارم، هیچ نیازی بە پشتبەستن نییە و پشتبەستن بۆ تاکپەرستی سێهەمە. ئەم تاکپەرستیە چوارەمینە بۆ کەسێک کە تێ نەگەیشتووە و پێ‌نەگەیشتووە، لێکدانەوەو وەردانەوەی زۆر ئەستەمە. بە کورتی هەر ئەمە بزانە کە دەبێ چەن شتی جۆراوجۆر هەبن کە چەشنێ پێوەندی تایبەتیان لە نێواندا بێ و بەو پێوەندییە وەکوو یەک شتیان لێ بێ؛ چونکە لە چاو مرۆڤی خواناسدا وا دیارە کە یەک شتی دیوە و ئەو شتانەی بە یەک دیوە و بە زۆری نەزانیون. هەر وەکوو چۆن مرۆڤ لە بەشی جۆراوجۆری وەکوو گۆشت و پێست و سەر و پێ و گەدە و جەرگ و شتی‌تر هاتۆتە دی، بەڵام لە واتادا مرۆڤ یەک شتە. بۆیە تۆ مرۆڤ بە بێ وردبوونەوە لە ئەندامانی بە یەک شت دەناسی، ئەو خواناسەش بەبێ وەردانەوە زۆر لەو شتانە سەیر دەکاو گەر پێی‌بڵێن چیت دیوە، دەڵێ تەنیا یەک کەسم دیوە. هەروەها گەر پێی بڵێن بیر لەچی دەکەیتەوە، دەڵێ تەنیا بیر لە یەک شت دەکەمەوە، بیر لە خۆشەویستەکەم دەکەمەوە. کەواتە هەموو شتی ئەو کەسە دەبێتە گراوەکەی و ئەویش هەر یەک شتە. بزانە، مەقامێک هەیە لە زانیندا کە ئەو کەسەی کە پێی دەگا، تێدەگا کە هەموو پاژەکانی ئەم دونیا پێکڕا بەستراون و ئەندامی یەک لەشن و ڕێژەی بەشەکانی جیهان - ئاسمان و زەوی و ئەستێرەکان- پێکڕا وەکوو ڕێژەی ئەندامانی لەشی گیاندارێکە و ڕێژەی هەموو جیهان لەگەڵ چارەمەندی ئەو عالەمە -لە ڕەهەندێکەوە نەک هەموو ڕەهەندێ- وەکوو پێوەندی لەشە لەگەڵ گیان و ئاوەزی ئەو لەشە. تا کەسێک تێنەگا کە «انَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ عَلی صُورَتِهِ»، لەم باسە ناگات. لە سەرەتادا ئاماژەیەکمان بەم باسە کرد و چاتروایە هەر لێرەدا بیبڕینەوەو دوایی پێ بێنین، چونکە ڕەنگە زنجیرەی دێوانەکان بلەرزێنێ و هەرکەس توانی تێگەیشتنی نییە.

تاکپەرستی سێیەم، کە تاکپەرستیە لە کاردا، بە وردی لە ئەحیادا ڕاڤەمان کردووە، گەر پێت خۆشە زۆرتری لێ بزانی، لەوێ بیخوێنەوە. ئەوەی کە لە بنەمای بیرکردنەوەدا گوتمان بەستە، دەبێ بزانی کە هەتاو و مانگ و ئەستێران و هەورو باو باران و هەرچی بە هۆکاری دەزانی، هەموو لە ژێر ڕکێفی پەروەردگارن، وەکوو پێنووس لە دەست نڤیسیاردا و هیچ شت لە خۆڕا نابزوێ؛ چونکە ئەوانە لە کاتی خۆیان و بە قەدەر پێوستی خۆیان دەبزوێن، بەو جۆرەی نیازە. کەواتە هۆکارێکی‌تر بۆ ئەم کارانە

ڕەچاوکردن هەڵەیەو هەروەکوو ئەوەیە هۆی ئیمزا بە قەڵەم و کاغەز بزانی. ئەوەی کە پتر جێی سەرنجە، سەربەستی مرۆڤە لە کارەکانیدا و ئەم چەشنە بۆچوونەش هەڵەیە و مرۆڤ لە هەمان کاتدا کە سەربەستە، ناچاریشە. هەروەک بێژرا، کاری مرۆڤ بە پێی دەسەڵاتیە و دەسەڵاتیش پاشکۆی ویستە و مرۆڤ ئەوە دەکا کە دەیەوێ بیکا. کەواتە چونکە دەسەڵات لە ژێر رکێفی ویستەو ویستیش نیە لە ژێر دەستی ئەودا، هیچ شت لە دەست مرۆڤدا نییە. دەبێ بزانی ئەو کارەی کە دەڵێن مرۆڤ جێ بە جێی دەکا، سێ جۆرە:

**یەکەم** ئەوەی کە گەر بۆ وێنە پێ بەسەر ئاودا بنێ و پێی بڕواتە نێو ئاو، دەڵێن ئاوەکەی دڕیوە و لێکتری جیا کردۆتەوە؛ ئەمە پێی دەڵێن کاری سروشتی.

**دووەم** ئەوەی کە دەڵێن مرۆڤ هەناسەی کێشا؛ ئەمە پیێ دەڵێن کاری ئیرادی.

**سێهەم** ئەوەیە کە دەڵێن فلانکەس قسەی کرد و ڕۆیی؛ بەمە دەڵێن کاری سەربەست.

ئەو کارە سروشتیە، دیارە بە دەستی مرۆڤ نییە، چونکە کە کەسێک ڕۆیشتە سەر ئاو، لەبەر قورسی ئەو کەسە ئاوەکە دەشکێ و دەڕۆاتە خوار. جا ئەو کەسە پێی خۆش بێ یان ناخۆش بێ، ئەم کارە ڕوودەداو بە دەستی مرۆڤ نییە. تەنانەت گەر بەردێک لەسەر ئاودابنی، ناچار دەڕواتە خوارێ و ئەم ڕووداوەش نە لەبەر ویستی بەرد، بەڵکوو لەبەر گرانی بەردەکەیە.

کاری ئیرادی وەکوو هەناسەکێشانە. گەر بیری لێ بکەیتەوە دەزانی کە ناتوانی بەربەستی هەناسەت بێ، چونکە مرۆیان ئافراندووە کە هەناسەکێشان بە ویستی خۆی نەبێ، بیەوێ یان نەیەوێ؛ هەروەها گەر کەسێک بیەوی دەرزییەک بخا بۆ چاوی کەسێکیتر ئەویتر بە بێ ویستی خۆی چاوی لێک دەنێ، گەر بیەوی چاوی نەبەستێ، ناتوانێ و پیێ ناکرێ، چونکە وایان ئافراندووە کە بە ویستی خۆی نەبێ. هەر بەو چەشنەی کە بڕواتە سەر ئاو، بە ناچار لە ئاودا ڕۆدەچێ. کەواتە ناچاری و مەژبووری مرۆڤ لەمانەدا ئاشکرا بوو.

کاری سەربەست وەکوو گوتن و ڕۆیین؛ واتە ئەگەر بیەوێ دەیکا و گەریش نەیەوێ نایکا. بەڵام دەبێ بزانی، ئەگەر بیەوێ ئەو دەم دەیەوێ کە ئاوەز پێی بڵێ قازانجی تۆی تێدایە و ڕەنگە ئەو کارە پێویستی بە تێرامان بێ. کە گوتی ئەو کارە خێرە، بە ناچار ئەندامەکان دێنە جووڵە و دەبزوونەوە. وەکوو چاوتروکاندن لە کاتێکدا کە دەرزییەک بۆ چاومان فڕێ بدرێ.

بەڵام چونکە چاوترووکاندن لە کاتی فڕیدانی دەرزیدا کەڵکی تێدایە و مرۆڤ بە ڕاشکاوی دەیزانێ، نیازی بە بیرکردنەوە و لێکدانەوە نییە. بە ناسینی خێر و قازاج لە کارێکدا ویست دێتە دی و لە ویستیش هێزوورە دێتە دی. کە کارێک بیرکردنەوەی پێویست نەبوو، یان لە بیرکردنەوە دەرباز بوو، هەر دەڕواتەوە سەر هەمان دانستەی پێشوو و هەمان نیاز دێتە دی. گەر کەسێک بەدار لە کەسێکی-

تر دەدا و ئەو کەسەش بە گوێرەی سروشتی لەبەری هەڵدێ، تا دەگاتە لچ پاساریێ و گەر بزانێ کە بازدان ئاسانە، بازدەبا؛ بەلام گەر بزانێ بانەکە زۆر بەرزە، ناچار رادەوەستێ و راناکا؛ چونکە جوولان پاشکۆی ویستنە و ویستنیش پاش ئەوەی کە زانی قازانجی تێدایە دێت. لەم سۆنگەوە کەس ناتوانێ خۆی بکوژێ، هەرچەن هەم کاردی هەبێ و هەمیش دەست؛ چونکە هێزی دەست، لە بەندی ویستنایە و ویستنیش لە بەندی ئاوەزدایە کە ئەم کارە بە کەڵکە یان نە؛ ئاوەزیش ناچار وەکوو ئاوێنە هەرچی کە بێ، پیشانی دەدا، چونکە خۆ کوشتن کەڵک و قازانجی نییە و ئیزنی ناداو ویستیش پێک نایە؛ مەگین کاتێ تووشیاری کارەهاتی هاتبێ و هێزی بەرەنگاری ئەو کارەهاتەی نەبێ و کوشتنی پێ لە ژیان چاتر بێ. کەواتە، بۆیە بەمەیان گوت کاری سەربەست، چونکە لە بەندی نرخاندنێکە بۆ ئەوەی خێری لێ جیا بکرێتەوە؛ ئەگینا کاتێ دەستوور درا کە پێویستە، ئەمیش وەکوو ئەو کارانەی لێ دێ کە مرۆڤ ناچار دەبێ جێبەجێیان کا، وەکوو چاوتروکانن و هەناسەکێشان؛ ئەمانەش هەر وەکوو رۆچوونە لە نێو ئاودا.

ئەم هۆکارانە پێکرا بەستراون و ئەڵقەکانی ئەم زنجیرە هۆکارانە زۆروزەوەندن و بە وردی لە کتێبی «ئەحیا»دا لێکمان داوەتەوە. هێزوورە کە لە مرۆدا دانراوە، یەکێک لە ئەڵقەکانی ئەم زنجیرەیە. لێرەدا مرۆ پێی وایە ئەو هازە هی خۆیە، کەچی نازانێ پێوەندی دەگەڵ ئەو هازە پتر لەوە نییە کە ئەم راوپارێکە بوێ و هیچیتر. کەواتە، مرۆڤ راوپاری ویستێکە کە تێیدا دادەنرێ و راوپاری هێز و خوستێکە کە پێیێ دەدرێ و بۆیان ئافراندووە.

شتێکی وەکوو دار کە بە هۆی باوە دەجوولێ و دەشەکێتەوە، هیچ ویست و خواستێکی تێدا چێ نەکراوە و شەکانەکەی لەسەری ناچارییە، بۆیە پێیێ دەڵێن «جەبریڕەها»[1] یان جەبری تەواو. بەلام چونکە پەروەردگار هەر کارێک کە بیەوێ بیکا، دەسەلاتی نیە لە گرۆی هیچ شتەکیتردا و لە چێکردندا چاوی لە هیچ شت و کەسیتر نییە، بەو کارەی دەڵێن ئافراندن (اختراع[2]). بەلام چونکە مرۆ نە وەکوو ئەمەو نە وەکوو ئەو، کارەکانی لە سۆنگەی هۆکارگەلێکەوە روو دەدەن کە نین لە ژێر چەتری ویستی ئەمدا و وەکوو کارەکانی پەروەردگار نین کە ئافراندن و نوێهێنانی پێ بڵێن، هەروەها چونکە وەکوو داریش تەواو بێدەسەلات نییەو لە خۆیدا خودانی ویست و ئیرادەیە، ناکرێ وەکوو شەکانەوەی دار، جەبری رەهاشی پێ بڵێین.

---

١ - جەبری رەها: جبر مطلق.

٢ ـ ئەوەیە کە بەر لەوە هیچ شتی وا نەبووبێ و شتی وەکوو ئەوەش هەر نەبووبێ و لە ئافراندنی ئەو شتەدا هیچ نموونەو وێنەیەکیش نەبووبێ. (وەرگێر).

لە راستیدا مرۆڤ، کەرتێکی‌ترە و ناوێکی‌تری هەیە کە پێیێ دەڵێن: کەسب[1]. لەمەی بێژرا خویان بوو کە هەرچەن کاری مرۆڤ بە خواستی خۆیە، بەڵام چونکە لە خودی خواستنیدا ناچارە -بیەوێ یان نە- کەواتە هیچ لە دەستی خۆیدا نییە.

**سەرنج**

رەنگە بڵێی ئەگەر وایە دەسا پاداش و سزا چ واتایەکی هەیە و شەریعەت چ کەڵکێکی هەیە، چونکە هیچ کارێک بە دەستی مرۆڤ خۆی نییە. بزانە، ئەمە پاگەیەکە کە شەرع لە تاکپەرستیدا دەیلێ و تاکپەرستیش لە شەرعدا. لەم ناوەندەدا زۆر کەسی لاواز و بێ‌تین نوقم بوون. کەسێک لەم زەریایەدا دەرباز دەبێ کە یان بەسەر ئاودا بتوانێ بروا، یا خۆ مەلەوانی چاک بێ.

زۆربەی خەڵک چونکە توخنی ئەم دەریایە نەکەوتن، بە سەلامەت تێپەڕان. بەزەییەک کە بە خەڵکی رەمەکیدا هاتووە ئەوەیە کە لە بەستێنی ئەم زەریایەدا دانەنراون و لەوێ دوور کراون و تووشی خنکان نەهاتوون. ئەوانەی رۆیشتنە سەر زەریای تاکپەرستی، بۆیە خنکان چونکە مەلەیان نەدەزانی و نەیانویستووە کە مەلە فێربن و بە خۆیان خەڕەبوون و لەم دەریایەدا بزربوون و خنکان، چونکە هیچ شت لە دەستی مەدا نییە و هەرچی هەیە، هەرچی دەبێ و هەرچی دەکرێ، هەر ئەو دەیکا. ئەوەی حوکمی چارەڕەشییان لێ کردووە، بە کۆششەوە دەرباز نابێ و ئەوەی بەختەوەری بۆی نووسراوە پێویستی بە کۆششەوە نییە.

راڤەی راستەقینەی ئەم کارانە، هەرچەن لە نووسیندا نابێ، بەڵام چونکە باس گەیشتە ئێرە، ناچار دەبێ هێمایەکی پێ بکرێ:

ئەمەی کە گوتت «پاداش و سزا بۆ چییە؟» بزانە مەبەست لە سزا ئەوە نییە کە تۆ کارێکت کردووە و کەسێک لێت زویر بووەو بۆیە تۆڵەت لێ دەسێنێ و تەمبێت دەکا، یان لێت رەزا دەبێ و دیاری و خەڵاتت پێ دەدا، چونکە ئەم جۆرە تایبەتمەندییانە لە خوا بە دوورن. بەڵام هەروەک چۆن خڵتی خوێن، سەفرا یان شتێکی‌تر بەسەر لەشدا زاڵ دەبێ، مرۆڤ دەباتە دۆخێک کە پێی دەڵێن نەخۆشی، کە بە دەوا دەرمانی خۆت دەکەی، دەڕۆیتە دۆخێکی‌ترەوە کە پێی دەڵێن لەش‌ساغی؛ کاتێکیش شاوەت و تووڕەیی بە سەرتدا زاڵ بوون و لە بەندتیان کرد، لەوانەوە ئاورێکت لە گیاندا پێ دەبێ کە دەتفەوتێنێ. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «اَلغَضبُ قِطعَةٌ مِنَ النَّار»، گوتی ئەوە تووڕەیی نییە کە

---

[1] ـ کەسب: لە لای ئەشعەرییەکان مەبەست لە کەسب بەندیواربوونی هێز و ویستی بەندەیە بە ویستی دیاریکراو یان مەقـەدوورەوە. دەڵێن کردەوەی بەندەکان تەنیا بە پێی ویستی خوداوە جێبەجێ دەبێ و بەندە لە کارەکانیدا کاریگەری تەواوی نییە و ویستی بەندە دەکەوێتە پاش ویستی خوداوە. (وەرگێڕ)

بەسەر خۆتدا داتسەپاندووە، ئەوە پاژێک لە ئاورە. هەر وەکوو چۆن کاتێ تیشکی ئاوەز هێزی گرت، ئاوری شاوەت و تووڕەیی دادەمرکێنێ، تیشکی بڕواش ئاوری دۆژەهـ دادەمرکێنێ، تاکوو دەڵێ: «جز یا مُؤمِنُ فَانَّ نُورکَ اَطفَأَ نارا[1]». جەهەننەم بەبێ ئاخافتن لە دەست بڕوا هاوار دەکا، تەنانەت خۆی پێ ناگیرێ و تێکدەشکێ. هەر وەکوو چۆن مێشوولە لە هەمبەر با دەشکێ و ئاوری شاوەت لە ئاست تیشکی ئاوەز دەکوژێتەوە. کەواتە لە لایەکیترە شتێکت بۆ ناهێنن، بەڵکوو ئەوەی دەگەڵتە بۆ خۆت دەگەڕێتەوە «اِنَّما هِیَ اَعمالُکُم تُرَدُّ اِلیکُم»[2]. کەواتە تووی ئاوری دۆژەە، شاوەت و تووڕەیی خۆتە و ئەوە دەگەڵ خۆت و لە ناخی خۆتەو گەر «علم الیقین»ت بزانیایە، بە چاوی خۆت دەتبینی، هەروەک گوتی: كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ، لَتَرَوُنَّ[3] الْجَحِيمَ.

بزانە، هەر وەکوو چۆن زار مرۆ نەخۆش دەخاو بەرەو گۆڕستانی بەڕێ دەکا، شاوەت و گوناحیش دڵ نەخۆش دەخەن و ئەو نەخۆشییە دەبێتە ئاور بۆی و ئەو ئاورەش لە چەشنی ئاوری دۆژەهە نەک ئاوری ئەم دونیا؛ جا بە حوکمی هاوماک بوون، هەروەکوو چۆن کارەبا ئاسن بەرەو خۆی رادەکێشێ، دۆژەە، دۆژەهی بەرەو خۆی پەلدەکێشێ و هیچ تووڕەییەک لە ناودا نییە.

پاداشیش هەروایە و شرۆڤەی ماوەی زۆر دەبا. ئەمە پەرسڤی ئەو پرسە بوو کە گوتت پاداش و سزا بۆ چییە.

بەڵام ئەوەی کە گوتت «دەی شەریعەت و ناردنی پێغەمبەران بۆچییە؟» ئەمەش زاڵبوونێکی[4] گەورەیە تا خەڵک بەزنجیری زاڵبوون بەرەو بەهەشت بەرن. هەروەک گوتی: «اَتَعجَبُ مِن قَومٍ یُقادوُنَ اِلی الجَنَّة بِالسَّلسلِ[5]». بە کەمەندی دەسەڵات رایان دەگرن تا نەڕۆنە نێو دۆژەهەوە. هەروەک گوتی: «اَنتُم تَتَهافَتُونَ عَصی النَّار وَ اَنَا اخِذ بِحُجَزِکُم»؛ ئەنگۆ وەکوو پەپوولە خۆتان بە ئاوردا دەدەن و من ناوقەدتانم گرتووە و ناهێڵم. کەواتە بزانە یەک لە ئاڵقەکانی زنجیرەی جەبباری پەروەردگار، پەیڤی پێغەمبەرانە کە زانین و تێگەیشتنیان لێ چێ دەبێ تا راستەڕێ لە لاڕێ هەڵاوێرن؛ لە ترساندنیان ترس دێتە دی و ئەم تێگەیشتن و ترسە، تۆز لەسەر ئاوێنەی دڵ و ئاوەزت دەسڕنەوە. تا ئەم

---

١ ـ بلەز رابوورە خاوەن بڕوا! تیشکی تۆ ئاورەکەی کوژاندەوە.

٢ – ئەوە دۆژەەنییە، بەڵکوو کردەوەکانی خۆتانە کە بە سەرتاندا دراوەتەوە

٣ ـ (قورئان، ١٠٢/٥-٦) بەڵام ئەگەر راستەقینە و بزانیبا، ئاشکرا دوپەهتان دەدی. (هـ)

٤ ـ زاڵبوون: قهر؛ ئەمە لە زاراوەی سۆفییەکانە و بریتییە لە جەخت و پێداگری پەروەردگار لە سەر توانەوە و نەهێشتنی ویست و دۆز و مەبەستەکان؛ هەروەها بەربەستکردنی نەفس لە گەیشتن بە ئارەزووەکانی، هەروەک فەرمووی: «هو القاهر فوق عباده (ئەنعام/١٨)».

٥ ـ سەرت سووڕ دەمێنێ لەو خەڵکەی کە بە زنجیر بەرەو بەهەشت دەیانکێشن؟

دەستووورە کە ڕێی دوارۆژ چاترە لە ڕێی دونیا تێیدا بنوێندرێ و لەم نواندنە خواستی ڕێگابڕینی تێدا بەدی بێنێ و بە هۆی ئەم ویستەوە ئەندامەکان بجووڵێنەوەو بکەونەڕێ؛ چ بیانەوێ یا نەیانەوێ. بەم زنجیر، بە زاڵی ڕاتدەگرن و لە دۆزەهت دەرباز دەکەن.

پێغەمبەران وەکوو شوانن کە گەلەی مەڕیان داوەتەبەر و لە لای ڕاستیان میرغوزارێکی شین هەیە و لە لای چەپیان ئەشکەوتێکی پڕ لە گورگ؛ ئەم شوانە لە لای ئەشکەفت ڕادەوەستێ و دارەدەسەکەی بە دەور سەریدا دەسووڕێنێتەوە تا مەڕەکان بترسن و نزیکی ئەو ئەشکەفتە نەبنەوە و بەرەو مێرغوزارەکە بڕۆن. واتای ناردنی پێغەمبەران ئەمەیە.

بەڵام ئەوەی کە گوتت «گەر چارەی کەسێکی بە چارەڕەشی نووسیوە کۆشەوەکردن چ کەڵکی هەیە؟» لە ڕەهەندێکەوە ڕاستەو لە بارێکیترە نە. دروستبوونی ئەوەیە کە دەبێتە هۆی فەوتانت، چونکە نیشانەی ئەوەی کە بەختی ڕەشیان لە چارەی کەسێکدا نووسیوە ئەوەیە کە ئەم پەیڤەی دەخەنە دڵەوە تا کۆشەوە نەکاو نەچێنێ تا نەدروێ؛ هەروەها نیشانەی ئەوەی کە بە مردنی کەسێک دەستوور دراوە ئەوەیە کاتێ کەسێک برسی بوو، دەخەنە دڵیەوە کە نان نەخوا و بڵێ خواردن چ کەڵکێکی بۆم هەیە، ئەوەندە نان نەخوا تا لە برسانا بمرێ؛ هەروەها گەر هەژاری لە چاری کەسێکدا نووسراوە، دەخەنە دڵیەوە کە لە توو چاندندا چ کەڵکێ هەیە، تا هیچ نەکێڵێ و هیچیش هەڵنەگرێ. ئەوەی کە بەختەوەری لە چارەیدا نووسراوە، لە ڕاستەڕێ شارەزا کراوە، ئەوەش کە دەوڵەمەندی و ژینی تەیاری بۆ نووسراوە، خراوەتە دڵیەوە کە خێ بداتە کارو پاسەوانی و بازرگانی و سامان کۆوەکردن. هەروەها ئەم نووسینەش لە خۆڕاو بە گۆترە نییە، بەڵکوو بە گوێرەی هۆکارەکانە. هەرکەس بۆ کارێ ئافرێندراوە و هۆکاری ئەو کارەشی بۆ دابین کراوە، نە ئەوەی کە بەبێ هۆ و هۆکار بەو کارەی بگەینن. لەم سۆنگەوە پێغەمبەر فەرمووی: «اِعمَلُوا فَکُلٌّ مُیَسَّرٌ لِما خُلِقَ لَهُ[1]»؛ لەو بارودۆخەی کە بە زۆر بەسەرتدا داسەپێندراوە، دەتوانی دوارۆژی خۆت ببینی؛ کە بەردەوامی لەسەر کۆشەوەت بەسەردا زاڵبوو، بزانە گەر تاسەر وابی، ئەوە مزگێنی بەختەوەری و پێشەوایی دوارۆژت پێدراوە؛ بەڵام گەر تەمبەڵی و تەوەزەلیت بەسەردا داسەپا و ئەم بیرە بێفەڕە کە دەڵێی «گەر لە ئەزەلەوە نەزانییان لە چارەمدا نووسیوە، بۆچی بەبێ کەڵک خۆم بڕەتێنم؟» بەسەردڵتدا زاڵبوو، ئەوە بەڵگەی چارەڕەشیت لە پێش چاوەو بزانە ئەوە هێمایەکە بەوەی کە چجار ڕووی بەختەوەری و سەرۆکی دوارۆژ بە چاو نابینی. بە کورتی دوارۆژ بە گوێرەی دونیا هەڵسەنگێنە کە مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا

---

١ ـ کاربکەن، هەرکەس شیاوی ئەو شتەیە بۆی ئافرێندراوە.

بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ ١وَاحِدَةٍ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ ٢وَمَمَاتُهُمْ. کە لەم راستیانە گەیشتی، ئەم پرسەت بۆ چارەسەر دەبێ و تاکپەرستیت بەسەر دڵدا زاڵ دەبێ و لێت خویان دەبێ کە هیچ ناتەبایيەک لە نێوان شەرع و ئاوەز و تاکپەرستیدا نییە لە لای کەسێک کە چاوی دڵی کرابێتەوە. لەم چەمکەدا پتر لەمە نادوین، چونکە ئەم کتێبە جێگای ئەم باسە نییە.

## شرۆڤەی ئەو باوەڕەی کەبناغەی پشتبەستنی لەسەر دانراوە

بزانە گوتمان بنەمای پشتبەستن، دوو بڕوایە: **یەکیان** تاکپەرستی، کە راڤەمان کرد، **ئەویتریان** ئەوەیە کە بزانی ئافرێنەر هەر ئەوە، هەموو هی ئەون، دەگەڵ هەمووان دڵاواو دەهندەیە، لێزان و بەردەبار و پڕبەزەییە، بەزەیی و سەرنجی تەنانەت بۆ مێروولەو تۆفانەیەک -چ بگا بە مرۆڤ- پتر لە بەزەیی دایک بۆ کورپەی بەرمەمکانیە؛ هەروەک لە خەبەردا هاتووە. تێبگەی کە جیهان و ئەوەی تێیدایە لەسەر شێواز و بیچمێ خولقاندووە کە تەواو جوان و بەدەو و پڕ لە بەردەباری و ژیریيە و لەمە چاتر کەس ناتوانێ شتێ بخولقتێنێ. دەبێ بزانی کە لە هیچ بەزەیی و دلۆڤانیەک درێخی نەکردووە و هەرچی ئافراندووە، بەو چەشنەیە کە دەبێ بێ. گەر سەرلەبەری زانایان و پسپۆڕانی عالەم کۆوە بن و لە ژیری و لێزانیدا تەواو بن و لەسەر موویەک یان باڵی تۆفانەیەک رامێنن و بیانەوێ کەمایەسییەکی تێدا بدۆزنەوە و بڵێن نەدەبوایە وا بێ و دەبوا گەورەتر یان بچووکتر بایە، هیچ نابیننەوە و تێدەگەن کە هەموو شت بەو جۆرەیە کە دەبێ بێت. ئەوەی دزێوە، تەواوبوونی لەوەدایە کە تەواو بێ و گەر دزێو نەبایە، ناتەواو دەبوو و بەردەبارییەکی لێ بەخەسار دەچوو. گەر کرێتی نەخولقاندایە، کەس نرخی جوانی نەدەزانی و پێی نەدەحەسایەوە. گەر ناتەواو نەبایە، هیچ تەواوێک بە رێکی خۆی نەدەحەسایەوە و هێور نەدەبۆوە و چێژی نەدەبرد، چونکە تەواو و ناتەواو بە ڕێژەی یەکە کە دەناسرێن.

هەروەک گەر باب نەبوایە، خورتیش نەبوو، گەر کوڕیش نەبایە باب نەبوو. چونکە ئەم شتانە لە هەمبەر یەکە کە دەبن و بەرانبەری دوو شتە کە واتایەک پێک دەهێنێ و گەر دوو نەمێنێ و هەموو ببنە یەک، ئەوەی بە هەڵسەنگاندن پێی دەگەین نامێنێ. بزانە کە رەواو بەجێیە هۆی کارەکان لە خەڵک پیوار بێ، بەڵام دەبێ بڕوات بەوە بێ کە خێرت لەوەدایە کە ئەو فەرموویەو لە چارەتی نووسیوە. کەواتە هەرچی نەخۆشی و ناتەواوییە کە لە دونیادا هەیە، تەنانەت هەرچی گوناح و کوفر هەیە و ناتەواوی و خەسار و دەرد و ژانە، لە هەر یەکیاندا هۆیەک و بەردەبارییەک هەیە و بەو

---

١ ـ (قورئان، ٢٨/٣١) ئافراندن و مراندن و ژیاندنتان لەیەک نەفەر پتر نیە. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ٢١/٤٥) لەژی و مەر گیاندا وەک ئەوانەیان دادەنین؟ (هـ)

چەشنەی کە دەبێ ببن، هاتوونەتەدی. ئەوەی هەزار ئافرێندراوە، خێری لەو هەزارییەدایەو گەر دەوڵەمەند بایە، بە خەسار دەچوو؛ ئەوەش دەوڵەمەند خولقاوە هەروا. ئەمەش دەریایەکی بەرفراوان و قووڵە، وەکوو دەریای تاکپەرستی و زۆر کەسی مەلەنەزانی تێدا نوقم بووە. ئەم چەمکە بەنهێنیەکانی قەدەرەوە بەندیوارە و ئیزنی ئاشکرا کردنیان نەدراوە. گەر لەمەدا قووڵ بینەوە، قسەمان درێژە دەخایەنێ، بەڵام کاکڵەی باوەڕ ئەمەیەو پشتبەستن پێویستی بەم بڕوایە هەیە.

## شرۆڤەی راستەڤینەی پشتبەستن

پشتبەستن دۆخێکە لە دۆخەکانی دڵ و بەرهەمی باوەڕە بە تاکی و پڕبەزەیی و دلۆڤان بوونی پەروەردگار. واتە: دڵ دەبێ متمانەی بێ بە بریکاری پەروەردگار و لە سونگەی ئەم متمانەوە دڵ قایم و هێور بێ، تەنانەت چاوی لە رۆزی نەبێ و بەبۆنەی تێکچوونی هۆکارەکانی رواڵەتەوە نەشکێتەوە و ناهمێ نەبێ؛ بەڵکوو دەبێ لە پەروەرندەی ئارخەیان بێ کە رۆزی پێدەگەینێ. ئەمە وەکوو ئەوەیە کەسێ بە فێڵ و گزی داوای شتێ لە کەسێتر کاو ئەو کەسەش بریکارێک راسپێرێ تا ئەو فێڵە پووچەڵ کاتەوە. گەر بریکارەکەی خێوی چوار دانستە بێ، دڵی لە سەری دادەمرکێ و بیری دەحەسێتەوە:

**یەکەم** ئەوەی کە بە تەواوی شارەزای فێڵ و گزییەکانی بێ.

**دووەم،** دوو هێزی هەبێ بۆ دەربڕینی ئەوەی دەیزانی:

**یەکەم** هێزی دڵ کە بوێر و نەترس بێ؛

**دووەم** بە پاراوی زمان، چونکە کەس هەیە ئەو فێڵ و گزییانە دەناسێ، بەڵام نایدرکێنێ، یان لەبەر ترس یاخۆ لەبەر بێ زمانی.

**سێیەم** ئەوەی کە بەزەیی زۆری بۆ فێڵلێکراوبێ و بە دڵ داکۆکی لە مافی بکا.

کە ئەم سێ تایبەتمەندییەی تێدا دی، بە دڵ بڕوای پێ دەکاو بە هۆی ئەوەوە فێڵ و گزی لە خۆی دوور دەکاتەوە. هەروەها هەرکەس ئەم پەیڤەی سەلماند کە «نِعمَ المَولی وَ نِعمَ الوکیل[1]» باوەڕ دەکا کە هەرچی هەیە هەموو لە لایەن پەروەردگارە و هیچ کارکەرێکیتر بێجگە لەو نییە، هیچ کەمایەسییەک لە زانست و دەسەڵاتیدا نییە و بەزەیی و سەرنجی ئەوەندەیە کە پتر لەوە لە بیری مرۆڤیشدا ناگونجێ، بۆیە بە دڵ بڕوا بەهێزایی و بەزەیی خودانی دەکاو بە هۆی ئەوەوە فێڵ و گزییەکان پووچەڵ دەکاتەوە. دڵنیایە کە رسقی بۆ دابین کراوەو لە کاتی خۆیدا پێی دەدری و

---

١ ـ پەروەردگارێکی چاکە و بریکارێکی هێژایە.

کارەکانی بە جۆرێک کە شیاوی هێژایی و بەزەیی و دلۆڤانی بینایی چاوانە، بۆی جێبەجێ دەکرێ. ڕەنگە لەم دانستانە دڵنیا بێ، بەڵام لە سروشتیدا دڕدۆنگ بێ و ترسی بە سەردا زاڵ بێ. چونکە وا نییە کە مرۆڤ لە هەرچی دڵنیا بێ، تەبعی پێڕەوی لێ بکا، تەنانەت هەیە پێڕەوی لێ دەکاو دڵنیاشە کە هەڵە دەکا. وەکوو ئەوەی کەسێک بیەوێ هەڵوا بخواو یەکێکی‌تر بە پیسایی بچوێنێ و ئەمیش هەرچەند دەزانێ درۆیە، بەڵام نەتوانێ بیخوا؛ یان ئەوەی کە بیەوێ لە ژوورێکدا بە تەنیا دەگەڵ مردوویەک بنوێ و کەچی نەتوانێ، هەرچەند دڵنیابێ کە ئەوە مردووەو قەد هەڵناسێ. کەواتە پشت‌بەستن هەم پێویستی بە هێزی باوەڕ هەیە و هەم بە هێزی دڵ، چونکە واتای پشت‌بەستن، ئارخەیان‌بوونی دڵە بە پەروەردگار لە کارەکاندا. خەلیل بڕوایەکی تەواوی بوو کە گوتی: رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي[1]. گوتی: متمانەم هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی دڵم ئۆقرە بگرێ و هێور بێتەوە، چونکە لە سەرەتای حاڵدا ئوقرەی دڵ پاشکۆی داڵغە و هەستە، کە خەیاڵ و داڵغە بەرەو بەرزی و تەواوتربوون هەڵکشا، دڵیش دەداتە پەی و دەگاتە متمانە و باوەڕ و پیۆیستی بە دیتنی ڕواڵەتی نییە.

## ئاستەکانی پشت‌بەستن

پشت‌بەستن سێ ئاستی هەیە.

**ئاستی یەکەم** وەکوو بارودۆخی ئەو پیاوەیە کە لە کاتی شەڕدا بریکارێکی ئازا و بوێرو قسەزان و زمان پاراو و پڕبەزەیی بگرێ تا کاری بۆ جێبەجێ کا و دڵی ئارخەیان بێ.

**ئاستی دووەم** وەکوو ئەو منداڵەیە هەرچی بەرە رووی دەبێ،خۆی دەخاتە کۆشی دایکی، کاتی برسی بێ گاسی دەکا، کە دەترسێ، خۆی دەخاتە ئامێزی، ئەمەش سروشتی ئەو منداڵەیە و بە ویستی خۆی واناکا، ئەمە ئاستی کەسێکە کە لە پشت‌بەستندا ئاگای لە خۆی نییە، ئەوەندە نوقمی گەورەیی بریکارەکەیە، بەڵام ئەوەی پێشوو لە پشت‌بەستنی خۆی ئاگادارە و بە ویستی خۆی رووی لەم بریکارە ناوە.

**ئاستی سێیەم** ئەوەیە کە خۆی وەکوو مردوو دەزانێ لە ژێر دەستی مردووشۆردا، خۆی بە مردوویەکی بێ‌جووڵە دەزانێ کە بە دەستی پەروەرندەی دەبزوێ نەک بە ویستی خۆی، هەروەک مردوویەک کە دەستی مردووشۆر ئەم‌لاولای پێ دەکا، ئەم کەسە کە تووشیاری کارەساتیش بێ دوعا و گازە ناکا، وەکوو منداڵیش خۆی ناخاتە کۆشی دایکی، چونکە دەزانێ خوا وەکوو دایکێکی دڵسۆز

---

[1] ـ (قورئان، ٢/٢٦٠) پەروەرندەم! ئەتۆ مریان چلۆن زیندوو دەکەیتەوە؟ نیشانم دە. گوتی: ئاخۆ تۆ هێشتا باوەڕت نییە؟ (هـ)

دەگاتە هانای و چارەسەری کێشەی دەکا.

لەم ئاستە دوایینەدا هیچ دەسەلاتێک نییە: لە ئاستی دوومیش هیچ دەسەلاتێک بێجگە هانا بردن و سکالا و پاڕانەوە و دەست ڕاکێشان، نییە؛ بەلام لە ئاستی یەکەمدا ویست و دەسەلات هەیە. هەرکەس بە گوێرەی هۆکارەکانی بریکار چاوەڕوانی لێ دەکا و ئەویش بێگومان بۆی پێک دێنێ؛ وەکوو ئەوەی کە دەزانێ ئەم بریکارە تا پێناسە و بەڵگەی پێ نەدا کارێکی بۆ ناکا، دەبێ پێناسەی پێ بنوێنێ. پاشان چاوەڕوان دەمێنێ تا بزانێ بریکار چێ بۆ دەکا و هەرچی دێتە گۆڕێ، لە چاو بریکارەوە دەیبینێ و هێنانی پێناسەش بەگوێرەی ئاماژەی بریکار بووە، ئەوەی پشتبەستنی لەم ئاستەدایە، بازرگانی و پاسەوانی و هۆکارگەلی دونیایی بە نەریتی پەروەردگاری مەزن دەزانێ و وازیان لێ ناهێنێ، بەڵکوو بەبوونەی بەزەیی پەروەردگارەوە لەسەر خۆێ دەزانێ کە کارەکانی تا سەر ببا. چونکە کەل‌وپەل و هۆکاری بازرگانی پێدا و لەم ڕێگایە شارەزای کرد، دەبێ ئەم کارانە جێبەجێ کا و ئەوەی دەیبینێ لە خودای دەزانێ، هەروەک پێشتر شرۆڤەمان کرد. واتای « » ئەمەیە کە «حول» ئاژووتنە و «قوە» هێز و خوستە؛ کە تێگەیشت نە ئاژووتن و نە هازو هێز هی خۆی نییە، بەڵکوو هی پەروەرندەیە، ئەوەی دەیبینێ لەوی دەزانێ؛ بە کورتی کە هۆی هەموو کار و هۆکارێکی بە خودا زانی و بێجگە لە خوا هیچ کەسی‌تری بە سووڕێنەری جیهان و ئەوەی تێیدایە، نەزانی، ئەوە پشتی بەخوا بەستووە.

سەرترین ئاست هەرئەوەیە کە «ئەبووموسای دیلی» دەڵێ لە بایەزیدم پرسی: «پشتبەستن چییە؟» گوتی: «خۆت چی دەڵێی؟» گوتم: «ئەوەیە کە گەورەکان دەڵێن گەر لەلای چەپ و ڕاستەوە هەموو مارو ئەژدیها بێ و بێن بۆ لات و تۆ دڵت پێ نەلەرزێ». گوتی: «ئەمە ئاسانە، بەلام گەر خەڵکی جەهەننەم لە ئازار و سزادا ببینی و خەڵکی بەهەشت لە ناز و نیعمەتدا و لە دڵدا لە نێوان ئەمانەدا جیاییت دانا، پشتت بە خوا نەبەستووە». ئەوەی ئەبووموسا گوتی لە سەرترین ئاستەکانی پشتبەستنە و مەرجی ئەوەیە کە نەترسی. چونکە سددیق کاتێ دەگەڵ پێغەمبەر لە ئەشکەوتدا بوون، پاژنەی نا بە کونی مارەوە و پشتیشی بە خودا بەستبوو، بەلام ترسی ئەم لە مار نەبوو، بەڵکوو لە پەروەردگار بوو کە ماری ئافراندبوو و ئەو هێزی پێ دابوو، تاکوو « لاحَولَ وَ لاقُوَّةَ الاَّ بالله» لە ئاستی ئەودا ببینێ. بەلام ئەوەی بایەزید گوتی، ئاماژەیە بەو باوەڕەی کە بنەمای پشتبەستنە و ئەو بڕوایە گەلێک هێژایە؛ ئەوەش باوەڕە بە داد و هۆزانی و هێژایی و بەزەیی پەروەردگار، بەوەی کە هەرچی دەکا بەو چەشنەیە کە دەبێ بکرێ، کەواتە بەم پێیە هیچ جیاوازییەک نییە لە نێوان ئازار و سزا و نیعمەت و بەزەییدا.

**شێوەی کارەکانی ئەو کەسەی پشتی بە خودا بەستووە**

ئەوەی مەقامەکانی دین لەسەر سێ بناغەن: زانست و حاڵ و کردەوە. زانست و حاڵی پشتبەستن باسکراوە و هاتینە سەر کردەوە. ڕەنگە کەسێک وا بیر کاتەوە کە مەرجی پشتبەستن ئەوەیە کە هەموو کارەکانی بە خوا بسپێرێ و ئیرادە لە خۆ بستێنێ؛ کار نەکا و بژیوی ژینی دابین نەکا و بۆ داهاتووی ژینی دونیایی پاشەناز نەکا و لەبەر گورگ و مار و دووپشک هەڵنەیێ و گەریش نەخۆش کەوت هیچ دەرمان نەخوا. هەموو ئەمانەش هەڵەن و بە ئاوەژووی شەرعن. شەرع پەسنی پشتبەستنی کردووە، بۆچی بە ئاوەژووی شەرعە؟

دەسەڵاتی مرۆڤ یان لە بەدەستهێنانی سامانێکە کە نییەسی، یاخۆ لە ڕاگرتنی ئەو سامانەیە، یان خۆپارێزی لە زیانێکە کە هێشتا ڕووی نەداوە، یان قەرەبووی زیانێکە کەرووی داوە. پشتبەستن لە هەر یەکێ لەو چوارەدا، دەستوورێکی هەیە و ناچار دەبێ شرۆڤە بکرێ.

**بەشی یەکەم بەدەستهێنانی قازانج**

ئەمەش سێ جۆرە:

**یەکەم** ئەو هۆکارانەی کە بە سوننەتی خودامان زانی و بەبێ جێبەجێکردنیان هیچ کارێک پێک نایە و دوورگرتن و خۆبواردن لەو هۆکارانە، بەڵگەی گەوجی و نەفامییە، نەک پشتبەستن. وەکوو ئەوەی کە کەسێک دەست بۆ خواردن درێژ نەکا و هیچ نەخوا و بڵێ خوا خۆی تێرم دەکا یان دەست دەکێشێ و بڵێ بەڵکوو بە ئیزنی خوا پارووەکە خۆی بێتە نێو دەمم، یان کەسێک خۆی لە ژنهێنان دوور بگری و دەگەڵ خێزانی ببوێرێ و چاوەڕوان بێ کە لە خواوە منداڵیان بێ. ئەمانە پشتبەستن نین، بەڵکوو کەم ئاوەزی و گێلییە. بەڵکوو هەر کارێک کە بڕاوەتەوە، پشتبەستن تێیدا بە وازهێنان لە کار و کردەوە نییە، بەڵکوو پشتبەستن لە زانین و حاڵدایە.

بەڵام **زانین**، ئەوەیە کە بزانێ دەست و خواردن و هێزوجووڵە و دەمودان، هەمووی دەسکردی خودایە.

**حاڵ** ئەوەیە کە دڵی لە بەزەیی و هێژایی پەروەردگار ئارخەیان بێ، نەک لە خۆراک و دەست و دەمی. چونکە ڕەنگە کۆچ کەوێ و کەسێکیتر خواردنەکەی لێ بڕفێنێ. کەواتە دەبێ چاوی لە هێژایی پەروەردگار بێ کە ئافراندوویە و دەیپارێزێ، نەک لە هێز و توان و جووڵەی خۆی.

**دووەم**: ئەم هۆوانە کە تەواو پێویست نین بەڵام بەبێ ئەوانیش پێکهاتنی کار ئەستەمە؛ وەکوو هەڵگرتنی توێشووی سەفەر. دەسهەڵگرتن لەمەش مەرجی پشت بەخوا بەستن نییە، پێغەمبەر و پێشووان بەم جۆرە ژیاون. نابێ بڕوادار پشت بە توێشووەکەی ببەستێ، چونکە ڕەنگە توێشووەکەی بفەوتێ، دەبێ لەو کەسەی ئارخەیان بێ و پشتی پێ ببەستێ کە خۆی و توێشووەکەی دەپارێزێ؛

بەڵام ڕەوایە کەسێک بێ توێشوو ڕوو لە چۆڵ نەنێ و ئەمە پشتبەستێنیکی تەواوە و وەکوو نەخواردن نییە کە ناڕواتە ریزی پشتبەستنەوە. ئەمە بۆ کەسێک شیاوە کە خێوی دوو دانستە بێ: یەکەم ئەوەی کە ئەوەندە بەهێز و خوست بێ کە ئەگەر یەک حەوتە خۆراکی دەست نەکەوێ، پێی بکرێو پەکی نەکەوێ؛ دووەم ئەوەی کە بە خواردنی گیا و ڕوەک بتوانێ ماوەیەک بژی، چونکە زۆرتری چۆڵ و ساراکان ڕوەکیان تێدا دەڕوێ، بۆیە دەبێ بەوانەوە بژیێ تاکوو لە شوێنێکی دیاری نەکراوەوە خواردنی پێ دەگا.

ئیبراهیمی خەواس لەو کەسانە بوو کە پشتی بەخوا بەستبوو، بەبێ توێشوو ڕێگەی چۆڵی دەگرتەبەر، بەڵام دەرزی و نینۆکگر و گوریس و دۆڵچەی لەگەڵ خۆی دەبرد، چونکە ئەمانە لەو هۆکارانەن کە پێویستن، ئاو بە بێ دۆڵچە و گوریس هەڵناگوێزرێ و لە ساراشدا دۆڵچە و گوریس دەست ناکەوێ، هەروەها کە جلکی دڕا، تەنیا بە دەرزی بۆی چاک دەکرێتەوە. بۆیە پشتبەستن ئەوە نییە کە ئەم هۆکارانە، هەڵنەگرێ، بەڵکوو پشتبەستن ئەوەیە کە لە بەزەیی پەروەردگار دڵنیابێ، نەک ئەو هوکارانە.

کەواتە، گەر کەسێک لە ئەشکەفتێ دوورەپەرێز بگرێ و لەو دەورەدا هیچ ڕوەکی نەڕوێ و کەسیش ڕانەبووری و بڵێ بە تەمای خوا دادەنیشم، ئەوە حەرامە و خۆی بە کوشتن دەدا و سوننەتی پەروەردگاری نەناسیوە؛ ئەوە وەکوو پشتبەستنە بە بریکار لە تووشی شکات هاتندا، کە بێ پێناسە بڕۆیتە لای و کاری پێ بسپێری، هەرچەن دەزانی بەبێ پێناسە کار بۆ کەس پێک ناهێنێ.

لە ڕۆژگارانی ڕابردوودا، پارێزکارێک لە شار هاتەدەر و لە ئەشکەوتێکدا لە خەڵک دوورەپەرێز بوو، گوتی پشت بەخوا دەبەستم بژیوم بۆ دەنێرێ. حەوتەیەک تێپەڕا و هیچی پێنەگەیشت. کەوتە شەرارەی مردنەوە. وەحی هاتەسەر پێغەمبەری ئەو سەردەمە کە پێی بڵێ پەروەردگاری مەزن گوتوویە سوێند بە هێژاییم بژیوی پێ نادەم تا نەگەڕێتەوە نێو شار و لە نێو خەڵکدا نەمێنێتەوە. کە گەڕایەوە، خەڵک لە هەرلاوە شتێکیان بۆ هێنابوو. شتێ کەوتە دڵ پیاوی پارێزکارەوە، وەحی هاتە سەر پێغەمبەری سەردەم کە پێی بڵێ دەتەویست بە پارێزکاری خۆت هۆزانی من بەتاڵ کەیتەوە، نەتزانی کە پێم خۆشە بژیوی ژینی بەندەکانم لە دەست بەندەکانیترەوە دابین کەم تا لە دەست دەسەڵاتی خۆم؟ هەروەها گەر کەسێک لە خەڵکی شار هەڵبێ و لە ماڵی خۆیدا دابنیشێ و دەرگا لەسەر خۆی داخا و پشتببەستێ، ئەمەش حەرامە، چونکە ناتوانی بە تەواوی خۆت لە هۆوە پێویستەکان دەربازکەی. بەڵام گەر دەرگا دانەخا و پشت ببەستێ، ڕەوایە، بەو مەرجەی چاوی لە دەرگا نەبێ کە کەسێک شتێکی بۆ بێنێ و سەرجەمی دڵی لەلای خەڵک نەبێ، بەڵکوو دڵی لەلای خودا بێ و خەریکی بەندەگی و عیبادەت بێ و بەڕاستی بزانێ؛ چونکە دەرگای هەموو هۆکانی لە

خۆی دانەخستووە، خودا بژیوی پێ دەگەینێ.

لێرەدا ئەم دروست دەردێ کە دەڵێن: گەر بەندەیەک لەبەر رسقی خۆی هەڵبێ، رۆژییەکەی بەدوویدا دەگەڕێ؛ گەریش لەخوای مەزن بخوازێ کە رۆزی پێ بدا، پێی دەڵێ ئەی نەزان تۆم ئافزاندووە و رۆزیت پێ نادەم؟ چجار وانابێ، کەواتە، پشتبەستن ئەوەیە کە لەسەر رێی هۆکارەکان لانەچێ و رۆزییەکەی لە سۆنگەی هۆکارەکانەوە نەزانێ، بەڵکوو بژیوی خۆی لە لە لایەن هۆیهۆوەکان(مسبب‌الاسباب) بیزانێ، چونکە نووکوبەدی خەڵک بژیوی خوا دەخۆن؛ بەلام هەندێ بە سووکی و پەستی پارسەکی، هەندێ بە رەنج و چاوەڕوانی وەکوو بازرگانان، هەندڵ وەکوو پیشەسازان بەکار و کۆشەوەی زۆر و هەندێکیش بە ئاسوودەگی و هێژایی، وەکوو سۆفییەکان کە چاویان لە خودایە و ئەوەی پێیان دەگا لە خوای دەستێنن و چ خەڵکی لە ناودا نابینن.

**سێیەم،** ئەو هۆکارانە کە نە بە تەواوی و نە جاربەجار پێویست نین، بەڵکوو ئەوانە بە فێڵوگزی و پەیدۆزی دەزانرێن. رێژەی ئەم هۆکارانە دەگەڵ کەسبوکار، وەکوو رێژەی داخ و سیحر و فاڵ گرتنەوەیە بۆ نەخۆشی؛ چونکە پێغەمبەر وا پەسنی بڕوادارانێ کە پشتیان بە خودا بەستووە دەکا کە سیحر و داخ بۆ نەخۆشی ناکەن، نە بەوەی کە کار و کەسب ناکەن و شار بەجێ دێڵن و روو لە سارا دەنێن. کەواتە لەم مەقامەدا سێ ئاست بۆ پشتبەستن هەیە:

**یەکەم** ئاستی هەڵکەوتانە، ئەوانەی روو لە چۆڵ و سارا دەنێن بەبێ هەڵگرتنی توێشووی رێگا، ئەمەش بەرزترین ئاستی پشتبەستنە. ئەمە بەو چەشنەیە کە توان و هێزی پێنج شەش رۆژ برسیەتی هەیە، یاخۆ روەک دەخوا و گەریش نەیدییەوە، هیچ ترسێکی لە مردن نییە و دڵنیایە کە خێری لەوەدایە: چونکە ئەو کەسەی زادی رێ هەڵدەگرێ رەنگە لێی بستێنن و بمرێ، هەروەها هەموو کات مەترسی لەرێدا هەیە و دوور لێگرتنی زۆر پێویست نییە.

**ئاستی دووەم** ئەوەیە کە روو لە سارا نانێ و کاریش ناکا، بەلام لە مزگەفتدا دادەنیشێ و هیچ چاوەڕوانی خەڵک ناکا، بەڵکوو بە تەمای بەزەیی و کارسازی پەروەردگارە.

**ئاستی سێیەم** ئەوەیە کە بپەرژێنە سەر کەسبوکار، بەلام بە گوێرەی داب و نەریتی شەرع، هەر بەو چەشنەی لە بەشی کەسبوکاردا راڤەمان کرد. هەروەها لە پەیدۆزی و گزی و فزی و رێگەچارەی ورد و فێڵبازانە بۆبەدەست هێنانی رسق و رۆزی دووری دەگرێ؛ کە خۆی لەم کارانە نەبوارد، لە ئاستی ئەو کەسەدایە کە بۆ دەرمانی ناخۆشی لە داخ و سیحر کەڵک وەردەگرێ و هیچ پشتی بەخودا نەبەستووە.

بەڵگە بۆ ئەم پەیڤە کە وازهێنان لە کار و کاسبی مەرجی پشتبەستن نییە ئەوەیە کە سدیق کە لە ریزی پشت بەخوا بەسراوان بوو، پاش ئەوەی کە بوو بە خەلیفە پرێسکەی جلکەکانی هەڵگرت و

بۆ کاسبی رووی لە بازاڕ نا. گوتیان: «کاتێ خەلیفەی چۆن وادەکەی؟» گوتی: «گەر خێزانەکەم لەسەختیدا راگرم، زۆرتر خەڵکی تووشی سەختی و دژواری دەکەم». پاشان لە بەیتولماڵ یارمەتیەکیان بۆ بڕیەوە و لەوە بە دوا هەموو کاتی بۆ خەلافەت تەرخان کرد. کەواتە پشتبەستنی ئەو، ئەوە بوو کە تەمای لە ماڵوسامان نەبوو و ئەوەی بەدەستی هێنا لە لێهاتوویی و سەرمایەی خۆیەوە نەیدەزانی، بەڵکوو لە چاو خوداوە دەیزانی و ماڵی خۆی پتر لە ماڵی موسوڵمانانیتر خۆش نەدەویست.

بەکورتی پشتبەستنی بێپارێزکاری، پێک نایێ. کەواتە پارێزکاری مەرجە بۆ پشتبەستن، هەرچەند پشتبەستن مەرجی پارێزکاری نییە. ئەبووحەفسیحەدداد پیری جونەید بوو و لەوانە بوو کە پشتیان لە خودا بەستبوو. گوتی: «بیستساڵ پشتبەستنی خۆم دەشاردەوە و لەم سۆنگەوە هەموو رۆژێ دەرۆیشتمە بازاڕ و دینارێک کارم دەکرد و بەو دینارە، تەنانەت سەری گەرماویشم نەدەدا و سەرلەبەریم دەدایە سەدەقە». هەروەها جونەید لەلای وی باسی پشتبەستنی نەدەکرد، دەیگوت: «لەڕووم هەڵنایە لەلای ئەو باس لە مەقامێ بکەم کە هی خۆیە». بەڵام سۆفییەکان کاتێ لە شوێنێکدا دەمانەوە و مجێورەکەیان دەرۆیشتە دەرەوە، پشتبەستنیان لاواز دەبۆوە؛ وەکوو پشتبەستنی کەسێک کە کار دەکا. ئەوەش مەرجی زۆر هەیە تا ئەو پشتبەستنە راست و درووست دەربێ. گەر لەسەر «دەروو» (فتوح)[1] دابنیشێ، ئەمە لە پشتبەستن چاترە؛ بەڵام گەر لە شوێنێکدا ناوبانگی دەرکرد، ئەوە وەکوو بازاڕی لێ دێ و مەترسی لەڕێ کلابوونی هەیە، بەڵام گەر دڵی پێ نەبەستێ، وەکوو پشتبەستنی کاسبی لێ دێ؛ راستەکەشی ئەوەیە کە نابێ چاوی لە خەڵکوخوا بێ و بێجگە لە هۆیهۆوەکان نابێ متمانە بە کەس بکا، خەوواس دەڵێ: «خزری زیندەم بینی، ئاخافتن دەگەڵ منی پێخۆش بوو، بەڵام مالاواییم لێکرد و رۆییم، گوتم نەکوا متمانەی پێ بکەم و دڵم پێ رەزا بێ و پشتبەستنەکەم ناتەواو بێ».

ئەحمەدی حەنبەل کرێکارێکی بوو، بە شاگردەکەی گوت پتر لە مزی خۆی پێی بدەی، کرێکارەکە وەرینەگرت؛ کە رۆیشتە دەرەوە ئەحمەد گوتی:«برۆ بە دوویا، دەبێ وەریبگرێ». گوتی: «بۆچی؟»گوتی: «ئەو جار لە دڵیدا تەمای ئەو پارەی هەبوو، رەنگە لەبەر ئەوە وەرینەگرتبێ، کە چاوچنۆکی وازی لێ هێنا، لێتی دەسێنێ».

بە کورتی پشتبەستنی مامەلەگەر ئەوەیە کە متمانەی بە سەرمایەکەی نەبێ. نیشانەکەشی ئەوەیە کە گەر لێی بیدزن، دڵی ناگۆڕێ و لە رسقی خۆی ناهمێ نابێ؛ چونکە کە بە بەزەیی خوا

---

١- دەروو یان فتوح: ماڵ و نیعمەتێک کە لە غەیبەوە دەنێردرێ.

متمانەی کرد، چا دەزانێ کە پەروەردندەی لە شوێنێکەوە کە چاوەڕوانی ناکا کاری بۆ پێک دێنێ و گەریش نەیهێنا، خەیری ئەو لەوەدایە.

شێوازی بەدەستهێنانی ئەم دۆخە: بزانە زۆر دەگمەن و نایابە کەسێک بگاتە ئەو ئاستەی کە ماڵوسامانی ببەن و زیان ببینێ، دڵی لە جێی بێ و نەگۆڕێ؛ بەڵام هەرچەن هێژا و دەگمەنە، واش نییە کە کەس پێی نەگا. ئەوەش بەوە بۆی پێک دێ کە باوەڕ و متمانەیەکی پتەو و قایمی بە کامڵبوونی هێژایی و بەزەیی و دەسەڵاتی خودا لە دڵدا پێک هاتبێ و تێبگا کە زۆرکەس بەبێسەرمایەش رسق و رۆزییان هەیە و زۆر سەرمایەش دەبنە هۆی تێیاچوونی خێوەکەی، پێغەمبەر فەرمووی: «بەندە هەیە لە شەودا بیر لە کارێک دەکاتەوە کە زیانی خۆی تێدایە، پەروەردگار لەسەری عەرشەوە بە چاوی پڕ بەزەییەوە سەیری دەکا و ئەو کارەی لێ دەگێڕێتەوە؛ تەنانەت بەیانی کە لە خەو رادەبێ تەمی خەم دایگرتووە و دڕدۆنگ دەبێ کە کێ وای کرد و بۆچی کرد؟ ئەمە هەر ئەو کارە بوو کە فلان جیران کردی و سەرنج و بەزەیی خودای لەگەڵدا بوو». لەم سۆنگەوە بوو کە عومەری خەتتاب دەیگوت: «هیچ خەمم نییە بەیانی کە لە خەو رادەبم، هەژار بم یان دارا؛ چونکە نازانم خێرم لە چیدایە».

هەروەها بزانە، دڕدۆنگی و ترس لە هەژاریێ بیرێکە شەیتان دەیخاتە دڵتەوە: ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ[1]. لەم کاتەدا دڵنیابوون لە بەزەیی و خۆشەویستی پەروەردگار، ئەوپەڕی زانینە؛ بەدانستە کە زانیبێتی رۆزی لە هۆکارە پیوارەکانە و کەس تێیناگا. لە راستیدا بە هۆکارە پیوارەکانیش متمانە نەکا، بەڵکوو تەنیا لە مسۆگەری خودانی هۆکارەکان دڵنیابێ. پارێزکارێک کە پشتی بەخودا بەستبوو، لە مزگەفتدا خەریکی عیبادەت بوو. ئیمامی مزگەوت چەن جار پێی گوت: «تۆ هیچ سەرمایە و سامانێکت نییە، گەر کار بکەی بۆت چاکترە». گوتی: «لەم پاڵەوە جوویێک دەستەبەربووە کە رۆژی دوو کولێرەم پێ بدا». گوتی: «گەر وابێ ئێستا بۆت هەیە کار و کاسبی نەکەی». پارێزکار گوتی: «ئەی مێرخاس! تۆ گەر ئیمامی نەکەی بۆت چاترە. چونکە مسۆگەری جوویێک لە مسۆگەری پەروەردگار بەهێزتر دەزانی». ئیمامی جەماعەتێک بە یەکێک لە خەڵکەکەی گوت: «لە کوێ نان دەخۆی؟» گوتی: «راوەستە با نوێژی نیوەڕۆ کە لە پشت سەرتەوە خوێندوومە، بیخوێنمەوە»؛ واتە: تۆ باوەڕت بە مسۆگەری پەروەردگاری مەزن نییە. کەسانێک کە ئەمەیان تاقی کردۆتەوە، لە شوێنێک کە چاوەڕوانیان نەکردووە، دەروویان بۆ کراوەتەوە و باوەڕیان بەم ئایەتە کە

---

١- قورئان، ٢/٢٦٨.

دەڵێ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا[1]، پتەوتر بووە.

لە حوزەیفەی مەرعەرشیان پرسی: «چ شتێکی زۆر سەیرت لە ئیبراهیی ئەدهەم دی کە خزمەتت کرد؟» گوتی: «لە ڕێی مەککەدا زۆر برسیەتیمان کێشا، کاتێ گەیشتینە کووفە ئاسەواری برسیەتی لەڕوومدا بینی، گوتی: "لەبەر برسیەتی وا لاواز بووی و ڕەنگت زەرد هەڵگەڕاوە؟" گوتم: "ئەرێ". گوتی: "کاغەز و قەڵەم بێنە". بۆم هێنا. نووسی: "بەناوی خوای دەهندە و دلۆڤان. ئەی ئەو کەسەی مەبەستی هەمووکەسی و چاوی هەمووکەس لە تۆیە، من پەسنبێژ و شوکرانەبژێر و زیکربێژی تۆم، بەلام برسی و تینوو و رووتم، من ئەم سێیە کە کردۆتە بەشم، مسۆگەریانم، تۆش مسۆگەری ئەو سێیانە بە کەبەشی تۆن". نامەکەی پێدام و گوتی: "بڕۆەرە دەرەوە و دڵ بە کەس مەبەستە بێجگە لە خودا و چاوت لە دەستی کەس نەبێ بێجگە لە خودا. یەکەم کەس کە پێت گەیشت ئەم نامەیەی پێ بدە". هاتمە دەرەوە، یەکێکم بینی لەسەر حوشترێک، نامەکەم پێدا، وەریگرت و خوێندیەوە و دای لە پڕمەی گریان و گوتی: "لە کوێیە خودانی ئەم نامە؟" گوتم: "لە مزگەفتە". کیسە زێڕێکی پێدام کە شەشسەد دیناری تێدا بووە. لە یەکێکم پرسی ئەم کابرا کێیە؟ گوتی: "مەسیحیە؟" زێڕەکەم بردەوە بۆ ئیبراهیم و سەربهوردەکەم بۆی گێڕاوە. گوتی: "دەست لە زێڕەکە مەدە، ئێستا خاوەنەکەی دێ". هەر لەو دەمەدا کابرای مەسیحی هات و کەوتە بەرپای ئیبراهیم و رایمووسی و موسوڵمان بوو».

ئەبوو یاقووبی بەسری دەڵێ: «دە ڕۆژ لە حەرەمدا بە زگی برسی مامەوە. وەڕەس بووم، هاتمە دەر، شەڵغەمێکم دی کە داکەوتوو، ویستم هەڵیگرم، یەکێک لە دەروونمدا پێی گوتم: "دە ڕۆژ برسیەتی و پاشان شەڵغەمێکی سیسیاگ دەخۆی" وازم لێ هێنا و ڕۆیشتم بۆ مزگەوت. یەکێک هاتە ژوور؛ سندۆقێ نان‌کاک وشەکرو ناوکەی بادامی لە پێشم رانا . گوتی: "لە زەریادا بووین، گژەبایەکی توند هەڵیکرد. نەزرم کرد گەر بە سەلامەت بگەڕێمەوە ئەم سندۆقە خواردنە بدەم بە یەکەم هەژارێک کە پێی دەگەم». لە هەریەکە و بە قەدەر ناو لەپێکم هەڵگرت و گوتم ئەویتری بۆ خۆت. بە خۆمم گوت. بایان راسپاردووە تا لە بەحرا بژیوی تۆ دابین کا و تۆ لە شوێنیکی‌تردا بۆی دەگەڕی؟»

زانین و ناسینی ئەم شتە دەگمەنانە بڕوا بەهێزتر و پتەوتر دەکا.

شرۆڤەی پشتبەستنی خێزاندار: بزانە خێزاندار نابێ روو لە چۆڵ بنێ و واز لە کار و کەسب بهێنێ، بەڵکوو پشتبەستنی خێزاندار لە ئاستی سێهەم، ئەوەش پشتبەستنی کاسبکارە، هەر ئەو کارەی سدیق دەیکرد. چونکە پشتبەستن بە هۆی دوو مەرجەوە دەگاتە ئەنجام:

---

١- قورئان، ٦/١١

**یەکەم** ئەوەی کە بتوانێ لەسەر برسیەتیدا پشوودرێژ بێ و هەرچی دەست بدا قنیاتی پێ بکا، تەنانەت گەر گیا و روەکیش بوو.

**دووەم** ئەوەی کە باوەڕی بێ کە رەنگە رسقی ئەو برسیەتی و تەنانەت مردن بێ و خێری لەوەدایە، بەڵام ناتوانێ زۆر لە خێزانەکەی بکا کە ئەوانیش وابن، لە راستیدا نەفسی مرۆڤ وەکوو خێزانیە، ئەگەر لەسەر برسیەتی خۆی پێ نەگیرا و تووشی دڵەڕاوکێ بوو، نابێ واز لە کار و کاسبی بێنێ. هەروەها گەر بنەماڵەکەی پشوودرێژ بوون و بە پشتبەستن رەزا بوون، دیسان نابێ واز لە کار و کەسب بێنێ. کەواتە دەکرێ بە زۆر خۆی بە برسیەتی رابگرێ، بەڵام ناتوانێ خێزانەکەی برسی بهێڵێتەوە.

گەر کەسێک بڕواداریکی تەواو بێ و خەریکی پارێزکاری بێ، هەرچەن کار نەکا، هۆکاری رزق و رۆزییەکەی خویانە. وەکوو منداڵی لە نێو زکی دایکیدا ناتوانێ خۆی بۆ بژیوی هەوڵ بدا، کەچی رسقی لە رێگای ناوکەوە پێی دەگا. کە لە سکی دایکی هاتەدەر، لە سنگی دایکیەوە بژیوی پێ دەگا. کە توانی خۆراک بخوا، لە کاتی خۆیدا دانی پێ دەدا. کە دایک و باوکی مردن و سێوی مایەوە، خۆشەویستی لە دڵی خەڵکدا دەچێنێ، هەروەک بەرلەوە خۆشەویستی ئەو منداڵەی خستبووە دڵی دایک و بابیەوە. پاش ئەوە خۆشەویستیەکەی دەخاتە دڵی سەتان کەسیتر کە بەزەییان پێیدا بێتەوە و ئاگەداری بن. کە گەورەتر بوو توانی کاری پێ دەدا و نیازی کاری لە دڵ دەچێنێ و دەخاتە دڵیەوە کە بەزەیی بە خۆیدا بێتەوەو ئاگەداری خۆی بێ، هەروەک دایکی لەبەر بەزەیی و خۆشەویستی چاودێری لێدەکرد. گەر ئەم نیازەی لێ بگرێتەوە تا لە کەسبوکار سێوی کەوێ، روو لە پارێزکاری بنێ، هەموو دڵەکان تژی لە خۆشەویستی وی دەکا، تا خەڵکی بڵێن ئەم کابرایە خەریکی عیبادەتی خودایە، هەرچی خۆشتر و چاترە با بیدەین بە ئەو. بەر لەمە ئەو بەتەنیا خۆی دڵی بە خۆی دەسووتا و بەزەیی بەخۆیدا دەهات، کەچی ئێستا هەموو خەڵکی هان بەدیاریەوە و وەکوو سێوی بەزەییان پێیدا دێتەوە. بەڵام گەر کار نەکا و بە تەوەزەلی رایبوورێ، کەس بەزەیی پێیدا نایەتەوە؛ ئەم کەسە بۆی رەوانییە بە بیانووی پشتبەستنەوە، واز لە کارکردن بێنێ، چونکە پەرژاوەتە سەر پەرای نەفسی خۆی، دەبێ چاری خۆی بکا؛ گەر روو لەپەروەردگار بنێ و لە خۆی هەتیو کەوێ، ئەو دەم پەروەردگار بەزەیی ئەم دەخاتە نێو دڵی خەڵکی. لەم سۆنگەوە کەس هیچ پارێزگاریکی نەدیوە کە لە برسانا بمرێ.

کەواتە، هەرکەس لە چۆنییەتی پێکهێنانی کاری زەوی و ئاسماناندا رامێنێ و تێبگا کە چۆن خوای گەورە و مەزن کاری هەموویانی بە تەکووزی جێبەجێ کردووە، ناچار ئەم ئایەتەی بۆ خۆیان دەبێ کە دەڵێ: وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا». تێدەگا کە ئەوەندە جوان کاروباری وڵاتی پێک

هێناوە و نیازی دەسکردەکانی جێبەجێ کردووە، کە کەس لەم ناوەدا مافێکی لێ نافەوتێ مەگین بەدەگمەن، ئەوانەش خێر و قازانجیان لە فەوتانی ئەو مافەدایە، نەک لەوە کە وازی لە کەسب‌وکار هێنابێ؛ چونکە ئەوەش کە مالی زۆری کۆوە کردووە، بۆی هەیە مالەکەی بەخەسار بڕوا و خۆیشی بفەوتێ.

حەسەنی بەسری کە بەچاوی دڵ ئەم دۆخەی بینی، گوتی: «پێم خۆشە هەموو خەڵکی بەسرە بنەماڵەی من بن و یەک دەنکە گەنم، بایی دینارێک بێ». «وهیب بن الورد» گوتی: «گەر ئاسمان بێتە ئاسن و زەوی بێتە پۆلا و لە خۆمدا خەمی نان بخۆم، دەترسم ببمە موشریک». پەروەردگار رۆزی بە ئاسمان ئەسپارد تا کەس رێی تێنەبا. تاقمێک رۆیشتنە لای جونەید، گوتیان: «بژیوی خۆمان بدۆزین؟[1]» گوتی: «گەر دەزانن لە کوێیە بۆی بگەڕێن» گوتییان: «لە خودا داوای رۆزی بکەین؟» گوتی: «گەر دڵنیان لە بیری کردوون، بیخەنەوە بیری». گوتیان: «پشتی پێ ببەستین و بزانین چ دەکا؟» گوتی: «پشتبەستن بە مەبەستی تاقی کردنەوە، گومان و دڕدۆنگییە». گوتیان: «دەی چارمان چییە؟» گوتی: «واز لە چارکردن بهێنن». کەواتە، مسۆگەربوونی بژیو، دڵنیاییە لە رۆزیدەر، ئەوەی دابین‌کردنی رۆزی مسۆگەر دەکا، دەبێ روی تێ بکەن.

**مەقامێکی‌تر لە پشتبەستندا راگرتن و هەماری سامانە**

بزانە هەرکەس بە قەدەر بژیوی ساڵێکی هەمار کرد، لە پشتبەستن کلا بووە؛ چونکە رێگای هۆکارە پیوارەکانی بەستووە و متمانەی بە هۆکارە ئاشکراکان کردووە کە هەموو ساڵ دووپات دەبنەوە. بەڵام ئەوەی کە بە پێداویستیە هەنووکەییەکانی قنیاتی کرد، واتە لە خۆراک بە قەدەر تێربوون و لە پۆشەن بە قەدەر داپۆشینی خۆی، ئەوە لە ئاست پشتبەستندا ئەمەگدار بووە و لای نەداوە. بەڵام خەواس دەڵێ گەر کەسێک بە قەدەر چل رۆژ بژیوی هەمارکا، ئەوەش لە پشتبەستن کلا نەبووە، مەگین پتر لە چل رۆژ بێ. سەهلی توستەری دەڵێ: «گەر پتر لە چل رۆژیش هەمار بکرێ، پشتبەستن بەتاڵ نابێتەوە، بەو مەرجەی کە دڵ بە هەمارەکەی نەبەستێ».

حوسێنی مەغازلی لە مریدەکانی بێشر بوو، گوتی: «رۆژێ پیاوێکی قژ گەنم و جۆ هات بۆ لای بێشر. بێشر لاگوێلێ زێڕی پێدام و گوتی برۆ هەر خواردنێ خۆشتر و بەدەوترە ئەو بکڕە. چجار ئەمەم لێ نەبیستبوو. خۆراکم هێنا، دەگەڵی خواردی و قەد نەمدیبوو لەگەڵ کەسێک شتێ بخوا. کە تێریان خوارد، خۆراکی زۆر مایەوە، کابرای پرچ گەنم و جۆ هەمووی کۆوەکرد و هەڵیگرت و بردی.

---

١- بدۆزین: بۆی بگەڕێن.

سەرم سوورِ ما کە چۆن بێ ئیزن خواستن وایکرد. بێشر گوتی: «پێت سەیر بوو». گوتم: «بەڵێ». گوتی: «ئەمە فەتحی مووسڵی بوو، ئەمڕۆ لە مووسڵەوە بۆ سەردانی من هاتبوو، خواردنەکەی هەڵگرت تا پێمان فێر کا کە گەر پشتبەستن تەواو بێ، هەمارکردن هیچ زیانی نییە».

کەواتە، راستەقینە ئەوەیە کە بناغەی پشتبەستن لەسەر ئاواتی کورتە و بۆ ئەم مەبەستەش نابێ ڕێبواری ڕێی خوا هەمار بکات بۆ خۆی؛ هەروەها گەر هەماری کرد، ماڵ لەلای خۆی وەکوو ئەوە بزانێ کە لە خەزانەی پەروەردگارەو لێی ئارخەیان نەبێ، کە وابوو پشتبەستنی پووچەڵ نابێتەوە. ئەمەی بێژرا بۆ پیاوێ بوو کە تەنیابێ، بەڵام بۆ خێزاندار گەر بژیوی یەک ساڵی هەمبار کار، پشتبەستنی پووچەڵ نابێتەوە، مەگین ئەوەی پتر لەوە هەڵگرێ. پێغەمبەر بژیوی یەکساڵی بۆ خێزانەکەی دابین دەکرد تا دڵیان ئوقرە بگرێ، بەڵام بۆ خۆی لە بەیانیوە تا چاشتەنگاوی دانەدەناو گەریش دایبنایا هیچ زیانێکی بۆ پشتبەستنکەی نەبوو؛ چونکە چ ئەو بژیوە لەلای خۆی بایە و چ لەلای کەسیتر، بۆی وەکوو یەک بوو. لە خەبەرایە کە یەکێک لە یارانی «سوففە»(صفه) ئەمری خودای بەجێ هێنا، دوو دیناری لە نێو جلوبەرگدا بوو. پێغەمبەر فەرمووی «دوو داخ». **یەکەم** ئەوەی کە گەر بۆ خاپاندنی خەڵکی بە سەڵتی ژیابێ دوو داخ لە ئاور دەنرێ بەسەریدا بۆ ئازاردانی. **دووەم** گەر بۆ مەبەستی خاپاندنی خەڵکی نەبووبێ، بەڵام ئەم کۆوەکردنە ئاست و پلەی لە پەسلاندا دەشکێنێ، هەروەک چۆن دووداخ لەسەر ڕوومەتدا جوانی تێک دەدا. هەروەها لە ئاست هەژارێکیتردا کە کۆچی دوایی کردبوو، گوتی: «ڕۆژی پەسلان دێ و ئەم کەسە لەو ڕۆژەدا ڕوومەتی وەک مانگی چاردە دەدرەوشێ و گەر لەبەر هۆیەک نەبایە، لەو ڕۆژەدا وەکوو هەتاو بوو؛ هۆکەی ئەوەیە کە زستانان جلکێکی بوو، کە زستانان دوایی دەهات بۆ زستانی دوایی دایدەناو بۆ هاوینانیش کراسێکیتری بوو کە هەڵیدەگرت بۆ هاوینیتر». هەروەها گوتی: «ئێوە هیچ شت کەمتر لە بڕوا و پشوو درێژییان پێ نەداون». واتە هەڵگرتنی بەرگ بۆ ئێوە لە سونگەی لاوازی بڕواتانە. بەڵام ڕاگرتنی گۆزە و سفرە و ئافتاوە و ئەوەی بەردەوام بەکار ببرێ، ڕەوایە؛ چونکە سوننەتی خوا لەسەر ئەوەیە کە هەموو ساڵێ نان و جلوبەرگ لە ڕەهەندێکی نوێوە دابین دەبێ، بەڵام کەل و پەلی نوێ دابین نابێ و بە ئاوەژووی سوننەتی خوا جووڵانەوە، ڕەوا نییە. جلکی زستان لە هاویندا بە کەڵک نایە و ڕاگرتنی نیشانەی لاوازی باوەڕە.

### سەرنج

بزانە، گەر کەسێک وابوو کە بە هەڵنەگرتنی بژیو و جلوبەرگ، ئاژاوە دەکەوتە دڵی و چاوی لە خەڵک دەبڕی، وای بۆ چاترە کە ئەو شتانە هەمار کا. تەنانەت گەر کەسێک نەبوونێ پارچە زەوینێک

کە بژێوی ژینی دابین کا، ببێتە هۆی ئاژاوەی دڵی و نەتوانێ بپەرژێتە سەر یاد و بیری خودا، بوونی ئەو زەوینە بۆی چاترە؛ چونکە مەبەست لە هەمووی ئەوانە خەریکبوونی دڵە بە یاد و بیری خودا. هەندێ کەسیش وان کە بە بوونی ماڵوسامان ئاژاوە دەکەوێتە گیانیان، کەچی بە هەژاری دڵیان هێور و ئارامە. بەڵام گەر بە ماڵی فرە و ژینی پڕ لە زەرق و بەرق دڵی هێور دەبێ، ئەو دڵە لە ریزی دڵی دینداران نییە.

**مەقامی سێیەم: ناسینی ئەو هۆکارانەیەکە بەرگری لەزیان و خەسار دەکەن**

بزانە، هەر هۆکارێک کە بوونی پێویستە، خۆلێبواردنی مەرجی پشتبەستن نییە؛ تەنانەت کە ئەو کەسەی پشتی بە خودا بەستووە، دەرگاکەی داخا و گاڵەی بدا تا دز تاڵانی نەکا، یان لە سەفەردا چەک دەگەڵ خۆی ببا و لە دوژمن خۆ ببوێرێ، یان باڵاپۆشێ لەگەڵ خۆی ببا تا لەسەرمای بپارێزێ، هیچ لە پشتبەستن کلانەبووە. بەڵام گەر کەسێک سیر بخوا تا لەرێدا کاریگەری سەرمای بەسەردا کەم بێتەوە، ئەم جۆرە هۆکارە وردانە، وەکوو داخ و ئەفسوون، پشتبەستن پووچەڵ دەکەونەوە. بەڵام ئەوانەی هۆکاری رواڵەتین، واز لێهێنانیان، مەرجی پشتبەستن نییە.

عارەبێک رۆیشتە لای پێغەمبەر، فەرمووی «عارەب! حوشترەکەت چی لێکرد؟» گوتی: «بەرەڵلام کرد و پشتم بەخوا بەست». فەرمووی: «حوشترەکەت ببەستەوە و پاشان پشت بەخوا ببەستە». بەڵام گەر رەنج و ئازارێ بگاتە مرۆڤ، خۆڕاگری و بەرگرینەکردن لەو زیانە، لە پشتبەستنە: هەروەک پەروەردگار فەرمووی: وَدَعۡ أَذَىٰهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا[1]. هەروەها گوتی: وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ[2]. بەڵام گەر ئەو رەنج و ئازارە لە سۆنگەی مار و دووپشک و درندەوە بێ، نابێ لەسەری پشوودرێژ بێ و دەبێ بەرگری لێ بکا. کەواتە، هەرکەس بۆ بەرگری و پاراستنی خۆی لە دوژمن چەکی هەڵگرت، گەر ئارخەیانیەکەی لە سۆنگەی چەکەکەوە نەبێ، پشتبەستنەکەی دروستە؟ هەروەها گەر دەرگای خانووکەی گاڵەدا، لە قوفڵەکەی دڵنیا نەبێ، چونکە زۆر قوفڵ هەیە کە نەیانتوانیوە بەرگری لە دز بکەن. نیشانەی پشتبەستنی راستەقینە بە خوداوەند ئەوەیە کە کاتێ هاتیتەوە بۆ ماڵ و ببینێت دز لێی داوی، خەمبار و نارەزا نەبی و رازی بی بە رەزای پەروەرندەت؛ دەبێ کاتێ رۆیشتیە دەرەو بڵێی: «بۆ بەرگری لە ویستی تۆ ئەم دەرکەم گاڵە نەدا، بەڵکوو مەبەستم لەم کارە دانان بە سونەتی تۆدا بوو. پەروەردندەم! گەر کەسێک بەسەر ماڵ

---

١ - (قورئان، ٤٨/٣٣) گوتی بە ئازاریشیان مەدە. هەر خۆت بە خودا بسپێرە و خودا بریکار بێ بەسە. (هـ)

٢ - (قورئان، ١٢/١٤) هەر ئازارێکیشمان بدەن، خۆ رادەگرین. با ئەوانە خوا بە پشتیوان دەزانن، خۆیان بدەنە دەس خودا. (هـ)

و خانوومدا داسەپێنی، هیچ خەمبار نیم، چونکە نازانم ئەوەی پێت داوم ڕۆژی منە یاخۆ هی کەسیترە و بە ئەمانەت لەلای منە».

کەوابوو، کە گەڕاوە بۆ ماڵی خۆی و دیتی کە دز لێی داوە و خەمبار بوو، کەڵکی ئەم ڕووداوەش هەر ئەوەیە کە لێی ڕوون دەبێ ئەم ماوەی کە پێی وابووە پشتی بەخودا بەستووە، لە ڕاستیدا نەفسی فێڵی دەگەڵ کردووە. گەریش پشوودرێژ و بەکاوەخۆ بوو و گلە و گازندەی نەکرد، ئاستی پشوودرێژی خۆی ناسیوە؛ گەر هەم گلە و گازندەی کرد و هەمیش بۆ دیتنەوەی دزەکان کەوتە گەڕان، لە ئاستی پشوودرێژی دابەزیوە و لێی ڕوون دەبێتەوە کە نە لە ریزی پشوودرێژانە و نە لە ریزی ئەوانەی پشتیان بەخوا بەستووە، تاکوو بە وادە و بەڵێنی نەفسی هەڵنەفریوێ و بە گوریسی نەفسی خاپینۆکیەوە نەڕواتە نێو چاڵ و ئەم قازانجەش کە لە سۆنگەی دزەوە پێی دەگا، گەلێک هێژا و بەنرخە.

**پرسیار:** گەر کەسێک بڵێ تا ئەو شتەت پێویست نەبایە، دەرگات دانەدەخست و گاڵەت نەدەدا، کە پێویستت بوو و لێتیان دزی، چۆن دەبێ نگەران نەبی؟

**پەرسڤ:** بەوەوە پێی دەکرێ کە تا ئەو دەمەی پەروەردگار ئەو شتەی پێ داوە، پێی وایە کە خێری ئەوی تێدایە، چونکە لەگەڵیایە و بۆی دەیپارێزێ،، هەنووکەش خێری لەوەدا بووە کە لێی بستێننەوە و لەگەڵ ئەمدا نەبێ، نیشانەی ئەم خێرەش ئەوەیە کە چیدی ئەو شتەی بەلاوە نییە، کەواتە لە هەردوو دۆخدا بەو چاکەی کە دەگەڵی کراوە شادوشوکر دەبێ و دڵنیا دەبێ کە پەروەردگار هیچی بەسەردا ناهێنێ مەگین ئەوەی قازانجی ئەمی تێدا بێ و ئەمیش نازانێ خێری لەچیدایە و خودا چاتر لە هەمووان دەیزانێ. وەکوو نەخۆشێک کە باوکێکی دلۆڤان پزیشکی بێ، گەر گۆشت و خۆراکی خۆشی پێ بدا، شاد دەبێ و دەڵێ: «گەر شۆپی تەندروستی نەدبایە، ئەم خواردنەی پێ نەدەدام». گەریش ئەو خۆراکانەی لێ بگرێتەوە، دیسان شاد دەبێتەوە و دەڵێ: «گەر دڵنیا نەبایە کە زیانی بۆم هەیە، لێمی نەدەسەندەوە». تا کەسێک نەگاتە ئەم باوەڕە، ئاخافتن لە پشتبەستن لە شاتوشووت بەولاوە چیدی نییە.

## شێوازی هەڵسوکەوتی مرۆڤی پشتبەخوابەستوو کاتێ ماڵی دز بیبا

پشتبەستوو دەبێ بەم شەش شێوازە هەڵسوکەوت کات:

**یەکەم،** هەرچەند دەرگاکەی گاڵە دەدا، بەلام پەیدۆزی و بنکۆڵی نەکا و پەتی زۆر لە دەرگاکەوە نەبەستێ و لە جیرانان نەخوازێ چاودێری خانووەکەی بکەن. مالک کوڕی دینار پەتێکی بە دەرکی ماڵەکەیەوە دەبەست و دەیگوت گەر لەبەر سەگ نەبایە، ئەوەشم نەدەبەست.

**دووەم،** هەرچی بەنرخە و رەنگە دنەی دز بدا بۆ دزینی، لە ماڵەوە رانەگرێ، چونکە دنەدەرە بۆ تووشیاری گوناح بوون. «مغیرە» مەشکەیەکی ئاوی نارد بۆ ماڵکی دینار. پاش ئەوە ماڵک هەواڵی نارد کە وەرە و ئەم مەشکەیەت ببەرەوە؛ چونکە شەیتان دڵی تووشی وازوازی کردووم کە نەکوا دز ئەم مەشکەیە ببا. ماڵک نەیدەویست هەم خۆی تووشی وازوازی بێ و هەم کەسێکیتر تووشی گوناح کا. کاتێ بووسلەیمانی دارانی ئەمەی ژنەفت گوتی: «ئەمە لەبەر سستی دڵی سۆفیەکانە. ئەو خۆی لە دونیا پاراستووە، بە ئەوچی کە دز دەیبا؟» ئەمەیان تەواوترە.

**سێیەم،** کاتێ لە ماڵ هاتەدەر وا نییەت کا کە گەر دز ماڵەکەی برد، گەردنی ئازاد بێ؛ تا ئەگەر هەژار بوو لەم سۆنگەوە نیازی پێک بێ و گەریش دەوڵەمەند بوو ئیدی چاوی لە ماڵی خەڵکوخوا نەبێ و ماڵی خەڵکی نەبا و ماڵی ئەم ببێت بە فیدای ماڵی موسوڵمانانیتر. ئەمە هەم بەزەییە بە دز و هەمیش بە موسوڵمانانیتر. هەروەها بەم نییەتە ویستی خودا ناگۆڕێ و پاداشی سەدەقەشی بەر دەکەوێ، گەر ببەن لە بەرانبەر هەر درهەمێک حەوتسەد درهەم پاداشی پێ دەدرێ و گەریش نەیبەن خۆ نییەتێکی چاکی کردووە.

**چوارەم،** گەر شتێکیان لێ برد، خەمی نەخوات و خێری خۆی لەوەدا بزانێ و گەر گوتی لە رێی خوادا دام، بۆی نەگەڕێ و بنکۆڵی نەکا و گەریش پێیان دایەوە، وەرینەگرێتەوە؛ گەر وەریگرێتەوە، ماڵی خۆیە، چونکە تەنیا بە نییەتکردن ماڵەکەی لەدەستی دەرناچێ، بەڵام لە پاگەی پشتبەستندا زۆر هێژا نییە. ئیبنی عومەر حوشترێکی بزر بوو، زۆر بۆی گەڕا نەیدیەوە، ماندوو بوو، گوتی لەڕێی خودادا و گەڕایەوە مزگەفت و خەریکی نوێژ خوێندن بوو. یەکێک هات گوتی حوشترەکەتم دیوەتەوە، شەکاڵی هەڵکێشا کە بڕوا بەدوویا، پاشان گوتی: «استغفراللّٰه» و دانیشتەوە و گوتی: «گوتبووم لەڕێی خودادا، ئێستا ئیدی ناڕۆم بە دوویا». یەکێک لە شێخەکان دەڵێ: «برادەرێکم لە خەونا دی کە لە بەهەشتدا بوو، بەڵام خەمبار بوو، گوتم: "بۆچی لە بەهەشتدا خەمباری؟" گوتی: "ئەمە خەمێکە تا رۆژی پەسڵان دەگەڵمە، چونکە پلە و پاگەی زۆر بەرزیان لە بەرزترین شوێنی بەهەشتدا پێم نواند. کە لە هیچ شوێنی بەهەشتدا وێنەی نەبوو و زۆر پێی شاد بووم، کە ویستم بڕۆم گاسیان کردم کە بگەڕێوە، چونکە ئەمە کەسێکە کە لە رێی گەڕاندۆتەوە". گوتم: "کام رێ؟" گوتی: "تۆ گوتت فلان شت لەڕێی خوادا و بڕیارەکەت تاسەر نەبوو، گەر تا سەربایە، ئەمەشت بە تەواوی پێ دەدرا"».

کابرایەک لە مەککەدا نووستبوو، کە لە خەو رابوو هەمبانەی زێڕەکەی نەمابوو. یەک لە عابدانی گەورە لەوێ بوو، ئەوی تاوانبار کرد کە تۆ بردووتە. عابد کابرای بردەوە بۆ ماڵ، گوتی زێڕەکەت چەند بوو، بە قەدەر ئەوە زێڕی پێ دا. کە کابرا گەڕایەوە تێگەیشت کە زێڕەکەی لەلای برادەرێکیدایە و

گاڵتەی لەگەڵ کردووە. ئەمیش زێڕەکەی گەڕاندەوە بۆ کابرای عابد. عابید گوتی نییەتم کرد کە لەڕێی خودادا بێ، نایبەمەوە. هەرچەند کابرا پێداگری کرد، نەیبردەوە و ناچار لەناو هەژاراندا دابەشی کرد. پێشوونان کاتێ خواردنیان بۆ هەژارێ دەبرد و ئەم هەژار ڕۆیشتبوو، زۆر بە سهێتیان دەزانی بیهێننەوە بۆ ماڵ و بیخۆن؛ بۆیە بە هەژارێکیتریان دەدا.

**پێنجەم:** ئەوەیە کە تووک و نەزای ستەمکار و دز نەکا، چونکە بەم کارە هەم پشتبەستن بەتاڵ دەبێ و هەمیش ئەوەی هەناسە بۆ ڕابردوو هەڵکێشێ، پارێزکار نییە. ڕەبیعی خەیسەم ئەسپێکی بوو کە بایی چەنهەزار درهەم بوو. لێیان دزی، گوتی: «چاوم لێ بوو کە دەیانبرد». گوتیان: بۆچیت هێشت؟ گوتی: «ئەوەی تێیدا بووم لەلام خۆشەویستتر بوو لەو ئەسپە؛ خەریکی نوێژ بووم». تووک و نزای جەردەکانیان کرد. گوتی: «هیچ مەڵێن، گەردنیم ئازاد کردووە و بەسەدەقە پێم داوە».

بە یەکێکیان گوت: «تووک و نزای ئەو کەسە بکە کە ستەمی لێ کردووی». گوتی: «ئەو ستەمی لەخۆی کردووە، نەک لە من. هەر ئەم شەڕەی بۆ بەسە و نامەوێ لەمە زۆرتر شەڕی بۆ بخوازم». لە خەبەردایە کە: «بەندە تووک و نزای ستەمکار دەکا و قسەی خراپی پێ دەڵێ تا بەتەواوی تۆڵەی خۆی لێ دەسێنێتەوە و ڕەنگە هیچ مافێکی بەسەر ستەمکاردا نەمێنێ».

**شەشەم،** دەبێ خەمی دزەکە بخوا و بەزەیی پێیدا بێتەوە، چونکە گوناحێکی تووش بووە و لەم سۆنگەوە سزا دەدرێ؛ هەروەها شوکرانەبژێر بێ کە ستەم لێکراوە و ستەمکار نییە و تووشی کارەسات هاتووە نەک گوناح. گەر خەمی ئەوە نەخوا کە کەسێک گوناحێکی بەڕەوا زانیوە، وەکوو ئەوەیە ئامۆژگاری خەڵکی نەکا و بەزەیی پێیاندا نەیەتەوە. فوزەیلی عەییاز کوڕەکەی دی کە ماڵەکەیان بردووە و خەریکە دەگری. گوتی: «بۆ ماڵەکەت دەگری؟» گوتی: «نە بۆ ئەو هەژارەی دەگریم کە ئەم کارەی کردووە و لە پەسلاندا هیچ بیانوویەکی نییە».

**مەقامی چوارەم- دەرمانی نەخۆشی و قەرەبووی ئەو زیانەی کە هاتۆتە دی**

بزانە، دەرمان سێ جۆرە:

**یەکەم** ئەوەی کە ئاشکرایە، وەکوو دەرمانی برسیەتی بە نان و تینوێتی بە ئاو و ئاوریش هەر بە ئاوپژان. دەست هەڵگرتن لەمانە مەرجی پشتبەستن نییە.

**دووەم** ئەوەیە کە نە ئاشکرا بێ و نە بە گومان، مەگین ئەوەی کە کاریگەربوونی لە هات و نەهاتدا بێ وەکوو سیحر و داخکردن. مەرجی پشتبەستن بە خودا دووری گرتنە لەم هۆکارانە بەو جۆرەی لە خەبەردا هاتووە؛ چونکە ئەنجامدانی ئەم کارانە بنکۆڵییە لە هۆکارەکاندا و باوەڕە بەو کارانە. بەهێزترینی ئەمانە داخە، پاشان سیحر و لاوازتریبنیان فاڵە، کە نەهاتی پێدەڵێن.

**سێیەم،** دوڕی ئەو دووانەی پێشووە، واتە ڕاشکاو نییە، بەڵام گومانی بە هێزە، وەکوو دووژ و

هەجامات و خواردنی رەوانکەرو دەرمانی ساردی بە گەرمی و گەرمی بە ساردی. وازهێنان لەمانە حەرام نییە، بەلام مەرجی پشتبەستنیش نییەو رەنگە برێ جاریش کردنی لە نەکردنی چاتر بێ. بەلگە بۆ ئەوەی کە دەسهەلگرتن لەمانە مەرجی پشتبەستن نییە، پەیڤ و کردەوەی پێغەمبەرە.

**پەیڤ-** فەرمووی: ئەی بە ندەکانی پەروەردگار. دەرمان بەکاربەن. هەروەها فەرمووی: «هیچ دەردێ نییە درمانی نەبێ، مەگین مردن؛ بەلام رەنگە بیزانن و رەنگە نەیزانن. پرسیاریان کرد کە؛ «سیحرو دەرمان چارەنووس دەگێرنەوە»؟ فەرمووی: «ئەوەش هەر لە چارەنووسدایە». هەروەهای گوتی: «شەوی میعراج بە سەرهیچ هۆزێک لە فریشتەکاندا تێنەپەرام کە پێم نەلێن بەئوممەتەکەت بفەرموو تا هەجامەت کەن». هەروەها گوتی: «حەڤدەو نۆزدەو بیستویەکی مانگ هەجامەت کەن تا نەکوا زالبوونی خوێن بتانکوژێ». بە سەعد کوڕی مەعازی گوت کە هەجامەت کە. عەلی چاوی نیشتبووە ژان، پێی گوت: لەمە مەخۆ (واتە خورما). لەمە بخۆ (واتە گەلاچۆنەر لەگەل کەشکی جۆی کولاو). بە سوهەیبی فەرموو: «چاوت ژان دەکا وخورما دەخۆی؟» گوتی: «بەو لای‌تری دەمم دەیخۆم». پێغەمبەر پێی پێکەنی.

**کردەوە:** هەموو شەوێ چاوی بە کل دەڕشت و هەر مانگ هەجامەتی دەکردو هەموو سالێ دەرمانی دەخوارد. کە وەحی هاتەخوار و سەری نیشتە ژان، سەری گرتە خەنە. کە شوێنێکی برینداردەبوو خەنەی دەنایە سەری و هەندێ جاریش خاکی پێدا دەمالی. لەم چەشنە زۆرەو کتێبێک لەسەر پزیشکی پێغەمبەر نووسراوە.

مووسا نەخۆش کەوت، بەنی ئیسرائیل گوتیان: دەرمانی ئەم دەردە فلان شتە. گوتی: دەرمان ناخۆم تا چاک نەبمەوە. دەرمانی نەخوارد. گوتیان ئەم دەرمانە بە ناوبانگە. و بەهێزەو دەمودەس چاک دەبیەوە. گوتی دەمەوێ دەردەکەم بمێنێتەوە. وەحی هاتە سەری کە «بەگەورەیی خۆم! تا دەرمان نەخۆی چاک نابیتەوە». دەرمانەکەی خواردو چاک بووەوە. بیرێک هاتە دلیەوە، وەحی هات کە «ویستت هۆزانی و بەردەباریم بە پشتبەستنی خۆت پووچەل کەیتەوە؟ کێ بیجگە من ئەو قازانجانەی لە دەرماندا دانا»؟ یەکێک لە پێغەمبەران لە بێهێزی خۆی گازندەی دەکرد. وەحی بۆ هات کە «گۆشت و شیر بخۆ». تاقمێ لە دزێوی مندالەکانیان گازندەیان کرد، لە لای پێغەمبەری سەردەمیان. وەحی هات کە پێیان بلێ «تا ژنەکانیان لە کاتی سک پڕ بووندا بەهێ بخۆن»، خواردیان و مندالەکانیان جوان بوون. پاش خواردنی بەهێ لە کاتی زگ پڕیدا، لە کاتی بریواندا[1] خورما بخۆن.

---

١ - بریوان: نفاس

کەواتە، ئاشکرا بوو کە دەرمان دەبێتە هۆی چاک بوونەوە، وەکوو نان و ئاو کە دەبنــە هــۆی تێــری و هەموو ئەمانەش بەئیزنی هۆیهۆکانە (مسبب‌الاسباب) کــە پێــک هــاتووە. لــە خەبــەردا هــاتووە کــە: «مووسا گوتی:"پەروەرندەم! نەخۆشی هی کێهــە و دەرمــان هــی کێیــە؟" فــەرمووی: "هــەردووی لــە منــە". گــوتی: "کەواتــە پزیــشک چ کەڵــکێکی هەیــە؟" گــوتی: "ئەمانــە ڕۆزی مــن دەخــۆن و دڵــی بەندەکانم خۆش دەکەن"». کەواتە لێرەشدا پشتبەستن بە گوێرەی زانست و بارودۆخــە، چونکــە لــە ئافرێنەری دەرمان دڵنیایە، نەک لە دەرمان، زۆرکــەس دەرمانیــان خــواردو بــە جێــی چــاکبوونــەوە، مردن.

**سەرنج**

بزانە داخیش خووی تاقمێکە، بەڵام ئەنجامدانی لادانە لە پشت بــەخوا بەســتن، تەنانــەت بــەرگــری لێکراوەو کەچی لە ئەفسوون نەهی نەکراوە. چونکە داخکــردن، برینێکــی گــەورە چــێ دەکــاو ڕەنگــە تەشەنە بکاو وەکوو حەجامات و خوێنبەردان نییــە، تەنانــەت قازانجەکەشــی وەکــوو هەجامــەت دیــار نییەو ڕەنگە بە جێی دەرمان دەردێکیتریش تووشی نەخۆش کا.

«عمران بن الحصین» نەخۆش کەوت. گوتیان داخ بکە، نەیکرد. زۆریان پێداگری کــرد، بۆیــە کــردی و چــاک بــووەوە. پاشــان گــوتی: «بەرلــە داخ، ڕۆناهیــەکم دەدی و دەنگێکــی خۆشــم دەبیــست و فریشتەکان سلاویان لێ کردم، کەچی لەو دەمەیڕا ئەم داخەم کــرد، هــەموویان لــێم بــەرپیوار بــوون. بۆیە داوای لێبوردن لە خوا دەکەم و لە هەڵەی خۆم پاشگەز دەبمەوە». دواتر بە «مطــر بــن عبــدالله»ی گوت: پاش ماوەیەک پەروەردگاری مەزن ئەو کەرامەتەی پێ دامەوە.

**شروڤەی ئەمەی کە نەخواردنی دەرمان لە هەندێ کاتدا چاترە** و ئەمەش دژایەتی لەگەڵ شێوازی پێغەمبەر نییە. زۆر لە گەورەکان دەرمانیان نــەکردووەو ڕەنگــە بــڵێی گــەر ئەمــە ڕەوا بایــە پێغەمبــەر دەرمانی نەدەکرد. ئەم پرسە بەم چەشنە پەرسڤ دەدرێتەوە کــە بــزانی نــەخواردنی دەرمــان شــەش هۆی هەیە:

**یەکەم** ئەو کەسە چاوی دڵی ویناپەو دەبینێ کە کاتی سەرەمەرگی گەیشتووە. لــەم ســۆنگەوە بــوو کاتێ سددیق لە سەرەمەرگدا بوو گوتیان پزیشکت بۆ گاس کەین؟ گوتی پزیــشک دیتــوومی، گــوتی: «انی اَفعَلُ ما اُریدُ» من ئەو کارە دەکەم کە دەمەوێ بیکەم.

**هۆی دووەم** ئەوەیە کە نەخۆش ئەوەندە پەرژاوەتە سەرترس لە دوارۆژ، کە دڵ و دەماخی دەرمــانی نییە. هەروەک ئەبوو دەردا کە کاتی نەخۆشی پێیان گوت: «لەبەرچی دەناڵــێنی؟» گــوتی: «لــە بــەر باری گوناحانم». گوتیان: «حەزت لە چییە؟» گــوتی: «ڕەحمــەتی خــودا». گوتیــان: «پزیــشکت بــۆ

گـاس کـەین؟» گـوتی: «مـن پزیـشک نەخۆشـی خـستووم». ئـەبوزەر چـاوی نیـشتبووە ژان، گوتیان:«بۆچی دەرمانی ناکەی؟» گوتی: «کاری لەمە گرینگترم هەیە». ئەمە وەکوو ئەوەیە کەسێک بیەنە لای پادشایەک بۆ دادگایی‌کردن. کەسێک پێی بڵێ نان ناخۆی. ئەمیش بڵێ کەی ئێستا کـاتی نان‌خواردن و برسیەتییە. ئەمە تیزوپلار تێگرتن و دژایـەتی نییـە لەگـەڵ کەسـێک کـە نـان دەخـوا. بەسەهلی توستەریان گوت: «خواردنت چییە؟» گوتی: «یـادی خـودای زینـدوو و مـەزن». گوتیـان: «مەبەستمان بژیوە کە پێی بژی». گوتی: «بژیوم زانستە». گوتیان: «مەبەسـتمان خۆراکـە». گـوتی: «خواردن یادی خودایە». گوتیان: «نـە مەبەسـتمان خـۆراکی لەشـە». گـوتی: «واز لـە لـەش بێنـەو تەسلیمی پەروەرندەتی کە».

**هوی سێیەم** ئەوەیە کە رەنگە ئەو نەخۆشـییە، دەردێکـی کـۆن بـێ و ئـەو دەرمانـە لـە لای ئـەو نەخۆشە وەکوو ئەفسوون و سیحر وابێ و بە دەگمەن کاریگەرییـەکی بـێ. لـە راسـتیدا کەسـێک کـە پزیشکی نەزانێ، رەنگە زۆربەی دەرمانەکان بەم چەشنە سەیرکا. «رەبیعی خەیسەم» دەڵێ: «ویـستم بە دەرمان دەردەکەم چارەسەر کەم، بەڵام کە بیرم کـردەوە عـادو سـەموودو پێـشوونان بـەو هەمگـە پزیشکی شارەزاوە کە بوویان، تەفروتوونا بوون و پزیشکی کەڵکێکی نەبوو». وادیارە کـە ئـەو پزیـشکی بە هۆکارێکی ئاشکرا نەزانیوە.

**هۆی چوارم** ئەوەیە کە نەخۆش نایەوێ دەردەکەی چارەسەر بکرێ تـا پاداشـی ئـەو نەخۆشـییەی بەرکەوێ، یاخۆ پشوودرێژی خۆی تاقی دەکاتەوە. چونکە لە خەبەردایە کە پەروەردگار بەنـدەکانی بـە بەڵاو مێمل تاقی دەکاتەوە، هەروەک چۆن زێڕ بە ئاور. کـەس هەیـە لـە نەخۆشـی پـاراو و بێخـەوش هەڵدەسێ و کەسیش هەیە بەفەوتاوی و رەنج بە خەساری. سەهلی توسـتەری دەرمـانی بـۆ خەڵـکی دەنواندو خۆی هەرچەن نەخۆش بوو، دەرمانی نەدەخواردو دەیگـوت: «نـوێژی لـە جێـوە و لـەگـەڵ نەخۆشییەک کە پێی رەزابی، هێژاترە لە نوێژی بە پێوەو بە تەندروستیوە».

**هۆی پێنجەم،** ئەوەیە کە زۆر گوناحبار بێ و بیەوێ نەخۆشـی بـۆی ببێتـە کـەفارەی گوناحـەکانی. چونکە لە خەبەردایە کە تا و یاو کاتێ لە کەسێکدا دەئاڵێ لە هەرچی گوناحە پاکژی دەکاتەوە، وەکـوو تەرزە کە هیچ تۆزێکی بە سەرەوە نەبێ. عیسا گوتی: «زانا نییە ئـەو کەسـەی بـە نەخۆشـی و زیـانی ماڵی شادوشوکر نەبێ و هیوادار نەبێ کە دەبێتە کەفارەی گوناحەکانی».

مووسا سەیری نەخۆشێکی کردو گوتی: «خوایا رەحمی پێ بکـەی!» گـوتی:«چـۆن رەحمـی پـێ بکەم لە شتێکدا کە بە هۆی ئەوەوە رەحمی پێ دەکەم؟ چونکە لەم سۆنگەوە گوناحەکانی دەبـوورم و ئاستی بەرز دەکەمەوە».

**هۆی شەشم** ئەوەیە کە دەزانێ تەندروستی دەبێتە هۆی بێ‌ئاگایی و سەربزیوی و هەڵەوپەڵـە، بۆیـە

دەیەوێ نەخۆش بمێنێتەوە تا تووشی هەڵەو پەڵە نەبێ. هەروەها هەرکەس خێرێکیـان بـۆ ویـستبێ، هەموو کات بە نەخۆشی و بەلاو مێمل تەمبێیا دەکەن. بۆیـە گوتوویانـە بـڕوادار لـە سـێ شـت بـەری نییە: هەژاری و نەخۆشی و سووکی. لە خەبـەردا هـاتووە کـە خـودا دەڵـێ: نەخۆشـی بەنـدی منـەو هەژاری بەندیخانەی من؛ کەسێک لە کۆت و بەندو زیندان دەکەم کە خۆشیم بوێ.

کەواتە، گەر تەندروستیەک بێتە هۆی گوناح، سەلامەت لە نەخۆشیدایە. عـەلی هـۆزێکی بـینی کـە خۆیان خەملاندووە، گوتی: «ئەمە چییە؟» گوتیان: «ئەمە ڕۆژی جەژنی ئەم هۆزەیـە». گـوتی: «هـەر ڕۆژ کە گوناح نەکەین، ئەو ڕۆژە جێژنی ئێمەیە». گەورەیـەک لـە کەسـێکی پرسـی کـە: «چـۆنی؟» گوتی: «چاکم». گوتی: «هەر ڕۆژ کە گوناح نەکەی چاکی، کـە گونـاح بکـەی چ نەخۆشـییەک لـەوە کوشندەترە؟» دەڵێن بۆیە فیرعەون داوای خودایی دەکرد چونکـە چوارسـەد سـاڵ بـەبێ هـیچ ژان و ئێش و نەخۆشییەک ژیاو گەر نەخۆشییەکی پـێ بگەیـشتایە، چجـار وای نـەدەگوت. دەڵـێن: «گـەر بەندەیەک یەک دووجار نـەخۆش کـەوێ و لـە هەڵـەکانی پاشـگەز نەبێتـەوە، پێمێـرد پێـی دەڵـێ: هۆنەزان! چەن جار پێغەمبەری خۆم ناردە سەرت و هیچ گوێت پـێ نـەدا». گوتوویانـە کـە: «بـڕوادار نابێ چل ڕۆژی بەردەوام بە بـێ زیـان و ڕەنـج و نەخۆشـی بـێ». پێغەمبـەر ویـستی ژنێـک مارەکـا، گوتیـان: «قـەد نـەخۆش نەکـەوتووە». پێیـان وابـوو ئەمـە پەسـن و تاریفـە، پێغەمبـەر فـەرمووی: «نامەوێ». جارێک باسی سەرئێـشەیان دەکـرد، عارەبـێ گـوتی: «سەرئێـشە چییـە؟ مـن تـا ئێـستا نەخۆش نەکەوتووم». پێغەمبەر فەرمووی: «دوور بـە لـە مـن! هەرکـە دەیـەوێ سـەیری یـەکێک لـە خەڵکی دۆژەهـ کا، بڵێن بێتە سەیری ئەم کابرایە». عایشە گوتی: «ئەی پێغەمبەر خودا! کەس هەیـە لە ئاستی شەهیداندا بێ؟» گوتی: «هەیە، کەسێک کـەڕۆژێ بیـستجـار یـادی مـردن کاتـەوەو بـێ گومان هیچ شـت وەکـوو نەخۆشـی، مـردن ناخاتـەوە یـاد». لـەم سـۆنگەوە هەنـدێ کـەس چـاری نەخۆشییان نەکردووە. چونکە پێغەمبەر نیازێکی بەوە نەبوو، دەرمانی دەکرد.

بە کـورتی دووری لـە هۆکـارە ئاشـکراکان، دژایـەتی دەگـەڵ پـشتبەسـتن نییـە. عومـەر بۆشـام دەڕۆیشت، هەواڵیان پێ‌گەیشت کە لـەوێ چاوقووڵـکە هـاتووە، هەنـدێ گوتیـان نـەڕۆین و هەنـدێ گوتیان لە چارەنووس کلا نابین و دەڕۆین. عومەر گوتی: «لە چارەنووسی خودا، بە هۆی چارەنووسـی خۆیەوە هەڵدێن». هەروەها گوتی: «گەر یەکێک لە ئێوە دوو سارای بێ، یـەکیان پـڕ لـە تـەڕە گیـا و یەکیان پڕ لە گیای وشک، بۆ هەر یەک لەوانـە کـە مـەڕەکانی ببـا، چـارەنووس وابـووە». پاشـان بـە عەبدولڕەحمانی عەوفی گوت تۆ ڕات چییە، گوتی: «من لە پێغەمبـەرم بیـست کـە فـەرمووی: «کـە ژنەفتتان لە شارێکدا وەبا هاتووە، مەڕۆن بۆ ئەو شارە، کە لە شارێکدا بوون و لەو شـارەدا وەبـا داهـات، ئەوێ بەجێ مەهێڵن». پاشان عومەر سپاسی خودای کرد کـە رای ئـەم دەگـەڵ خەبـەردا هاودەنـگ

بووە. یارانی‌تریش ئەم بڕیارەیان قبووڵ کرد، بەڵام هۆی ئەوەی کە گوتوویە ئەوانەی هیشتا نەخۆش نەکەوتوون و لەو شارەدان، نابێ ئەوێ بەجێ بێڵن، ئەوەیە کە نەخۆشەکان بە تەنیا دەمێننەوەو رەنگە بمرن. هەروەها لە هەندێ خەبەردا هاتووە کە ئەوەی لە شارێکدا بێ و لەوشارە وەبا دابێ و لە بەری هەڵبێ، وەکوو ئەوەیە لە شەڕ لەگەڵ کافراندا لە بەریان هەڵبێ، چونکە دڵی نەخۆشان دەشکێ و کەس نییە خواردنێکیان پێ بداو بێ‌شک هەموویان دەمرن و زۆر دوورە کە رەحمەتی خودای بەرکەوێ.

**سەرنج:** بزانە، شاردنەوەی نەخۆشی مەرجی پشتبەستنە، تەنانەت ئاشکراکردن و گلەو گازندەکردن دژیوو ناحەزە؛ مەگین بە بۆنەیەکەوە؛ وەکوو ئەوەی کە بیەوێ بە پزیشکێک بڵێ، یان بیەوێ سستی خۆی دەربڕێ. هەروەک کاتێ عەلی نەخۆش بوو لێیان پرسی چاتری، سەلامەتی؟ گوتی: نە. هەموویان بەسەر سووڕمانەوە سەیری یەکیان کرد کە بۆچی گوتی نە؛ پاشان گوتی: «دەگەڵ خوای مەزن بوێری و پیاوەتی کەم؟» ئەمەش هەرشیاوی خۆیە، کە بەو هێزو گەورەییەوە، ناتوانی و بێ‌هێزی خۆی لە هەمبەر پەروەرندەی پیشان دەدا. لەم سۆنگەوە بوو کە گوتی: «پەروەرندەم! پشوو درێژی بکە بە رۆژیم». پێغەمبەر فەمووی: «لە خوا داوای سەلامەتی کەو بەلا مەخوازە». بەڵام بەبێ هۆ وتەنیا بۆ دەربڕینی نارەزایەتی ئاشکراکردنی نەخۆشی حەرامە، گەر بە مەبەستی گلە و گازندە نەبێ، حەرام نییە، بەڵام چاتر وایە زۆری دەرنەبڕێ و باسی نەکا؛ چونکە رەنگە زێدەڕۆیی کاو گومانی گلەو بناشتی لێوە بکرێ. دەڵێن نکەو ناڵە بۆ نەخۆش دەنووسین کە ئاشکرای کردووە. ئیبیلس هیچ شتەکی لە ئەیووب دەسنەکەوت، بێجگە لە ناڵە.فوزەیلی عەییازو بێشر و وۆهەیب کوڕی وەرد کە نەخۆش دەکەوتن دەرگای خانووەکەیان دەبەست تا کەسێک پێیان نەزانێ و دەیانگوت دەمانەوێ کە نەخۆش دەکەوین کەس سەردانمان نەکا، چونکە ئەوسا دەبێ گلەو گازندە بکەین لە دەست نەخۆشیمان.

## بنەمای نۆهەم - خۆشەویستی و تامەزرۆیی و رەزامەندی

بزانە، خۆشەویستی پەروەردگار بەرزترینی مەقاماتە، تەنانەت مەبەستی هەموو مەقاماتێ هەر ئەوەیە. پاژی کوشندەکان بۆ پاکژکردنەوەیە لە هەرچی کۆسپی رێگای خۆشەویستی پەروەردگارە، هەموو دەرباز کەرەکان کە بەر لەمە راڤە کران، دەسپێکن بۆ ئەم دۆزە، وەکوو تەوبە، پشوودرێژی و پاریزکاری و ترس و هیوا و... . ئەوەش لەمە بەدوا دێ، پاشکۆ و بەرهەمی ئەمەیە، وەکوو تامەزرۆیی و رەزامەندی. بەرزترین ئاستی تەواوبوونی بەندە ئەوەیە کە خۆشەویستی خودای بە سەردلدا زاڵ بێ، بە چەشنێ کە لە هەموو گیانیدا تەشەنە کا. کە وانەبوو، بێ شک خۆشەویستی شتگەلی تری بەسەر دڵدا زاڵ دەبێ، ناسینی راستەقینەی خۆشەویستی ئەوەندە ئاستەمە کە هەندێ لە کەلاموانان حاشایان لێ کردووەو گوتوویانە «کەسێک کە لەماکی تۆ نەبێ ناتوانی خۆشت بوێ، واتای خۆشەویستی فەرمانبەرداریيەو هیچیتر». هەرکەس وابیر کاتەوە، هیچ ئاگایەکی لە بنەمای دین نەبووە و نییە. راڤەی ئەم باسە زۆر گرینگەو ئێمە سەرەتا ئەو بەڵگە شەرعیانە کە ئەم دۆستیە پیشان دەدەن باس دەکەین، پاشان راستەقینەو دەستوورەکانی دەڵێین.

### بایەخ و هێژایی دۆستایەتی پەروەردگاری مەزن

بزانە هەموو موسوڵمانان رایان لەسەر ئەوەیە کە خۆشەویستی پەروەردگار فەرزەو پەروەردگار دەڵێ: يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ[1]. پێغەمبەر فەرمووی: «ئەوەیە کە خودا و پێغەمبەری لە هەموو شتێ خۆشتر بوێ». دیسان فەرمووی: «هیچ بەندەیەک باوەڕدار نییە تا ئەوەی کە خوداو پێغەمبەری خودای لە ماڵ و منداڵ و ژن و زارۆکی و نووک و بەدی خەڵکی خۆشتر بوێ». پەروەردگار فەرمووی: «گەر باب و کاڵ و ژن و زارۆک و ماڵوسامان و ئەوەی هەتانە، پتر لە خودا و پێغەمبەری خۆشتان دەوێن،

---

1 ـ (قورئان، ٥٤/٥) خوا خۆشی دەوێن و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێ.

چاوەروان بن تا ئەو دەمەی فەرمانی خوداتان پێـدەگا: إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ[1]. یەکێک بـە پێغەمبـەری گـوت: «خۆشـم دەوێـی». فـەرمووی: «خـۆت بـۆ هـەژاری تـەیار کـە». گـوتی: «پەروەردگاری مەزنم خۆشتر دەوێ». فەرمووی: «دەسا خۆت بۆ بەلا تەیارکە». لـە خەبـەردا هـاتووە کە کاتێ پێمێرد گیانی خەلیلی دەکێشا، ئیبراهیم گـوتی: «قـەد دیوتـە کـە دۆسـت گیـانی دۆسـت بگرێ؟» وەحی هات کە: «چ جار دیوتـە کـە دۆسـت دیـداری دۆسـتی پـێ نـاخۆش بـێ؟» گـوتی: «هەنووکە گیانم بگرە کە پێی رەزام». لە سکالاکانی پێغەمبەرایە کە دەیفەرموو: «اَللّٰهُمَّ ارْزُقْنـی حُبَّـکَ وَحُبَّ مَنْ اَحَبَّکَ وَحُبَّ مَنْ یُقَرِّبُنی الی حُبِّکَ وَاجْعَلْ حُبَّکَ اَحَبَّ الـیَّ مـنَ الْمـاء الْبـارد»؛ واتـە: پەروەرنـدەم! خۆشەویستی خۆت و خۆشەویستانت و خۆشەویستی هەرچی لە خۆشەویستی تـۆم نزیـک دەکاتـەوە بکە بە رۆزیم. دۆستایەتی خۆت لە لام خۆشەویستتر بێ لە ئاوی سـارد بـۆ کـانی. عارەبێـک هـات و گوتی: «ئەی محەممەد! پەسلان کەنگێیـە؟» گـوتی: «چیـت بـۆ ئـەو رۆژە خـستۆتە لاوە؟» گـوتی: «نوێژو رۆژی زۆرم نییە، بەلام خوداو پێغەمبەریم زۆر خۆش دەوێ». گـوتی: «لـە دوارۆژدا هەرکـەس لەگەڵ ئەوەیە کە خۆشـی دەوێ». سـددیق گـوتی: «هەرکـەس بێخەوشـانە خۆشەویـستی خـودای چەشـت، روو لـە دونیـا وەردەگێـرێ و بێـزی لـە خەڵـک هەڵدەسـێ». حەسـەنی بەسـری گـوتی: «هەرکەس خودای ناسی خۆشی دەوێ و هەرکەس دونیای ناسی لێی بێزار دەبێ».

هەروەها برِوادار تا خافڵ نەبێ شاد نابێتەوە، کە بیرکاتەوەو رامێنـێ خـەمبار دەبـێ. عیـسا لـە لای تاقمێـک زارو لاواز رادەبـورد، گـوتی: «چ قـەوماوە؟» گوتیـان: «لـە ترسـی ئـازاری پـەروەردگار وا تواوینەتەوە». گوتی: «بە ڕاست کە پەروەردگار دەبێ لە ئازارتان بپارێزێ». لە لای تاقمێکیتـر رابـورد لاوازترو بێهێزتر لـەوەی پێـشوو، گـوتی: «چ رووی داوە؟» گوتیـان: «لـە بـەر تامـازرۆیی بەهەشـت تواوینەتەوە». گوتی: «بەڕاست کە دەبێ پەروەردگار بەئاواتی خۆتان بتانگەینێ». لـە لای تاقمێـکیتـر رابورد کە لەوانی پێشوو لاوازتر و نەزارتربوون و روویان وەکـوو مانـگ دەدرەوشـایەوە، گـوتی: «ئـەنگۆ چیتان لێ قەوماوە؟» گوتیان: «خۆشەویستی پەروەردگار وای لـێ کـردووین». لـە لایـان دانیـشت و گوتی: «ئێوە نزیکەکانی پەروەردگارن. پێیان گوتووم دەگەڵ ئێوە دابنیشم». سرِی سـەقەتی دەڵـێ:

---

[1] ـ (قورئان، ٩/٢٤) بێژە: ئەگەر باب و کورو برا و ژن و خزمەکانوو ئەو ماڵەی پەیداو کردووەو کەلوپەلی بازرگانی کـە دەترسـن لـە برەوکەوێ و خانوو بەرەی رندو دڵخۆشکەرەی خۆتان، پێ لە خوداو پێغەمبەرو خەزاکردن لە رێـی خـوادا گرینگتـرە، چـاوەنۆربن تـا فەرمان لە خوداوە دەگا. ئەوانەی لەرێ لادەرن، خودا شارەزایان ناکا. (هـ)

،ڕۆژی پەسلان هەرکەس بە ناوی پێغەمبەریەوە گاس دەکەن، دەڵێن: "ئەی ئوممەتی مووسا! ئەی ئوممەتی عیسا! ئەی ئوممەتی محەممەدا!" مەگین دۆستانی خودا کە پێیان دەڵێن: "ئەی دۆستانی خودا! وەرنەلای پەروەرندەتان". دڵی ئەم کەسانە لە خۆشییانا لە جێ دەردێ». لە کتێبی هەندێ لە پێغەمبەراندا هاتووە کە خودا دەڵێ: «بەندەکەم تۆم خۆش دەوێ، بە حەققی من کە تۆش منت خۆش بوێ».

## ڕاستەقینەی خۆشەویستی

بزانە، ئەم خۆشەویستیە ئەمەندە دژوارە کە بڕێ کەس حاشایان لێکردووە. ڕاڤەی ئەم باسە زۆر گرینگە و تێگەیشتنی زۆر ئاستەمە، بەڵام بە نموونە هێنانەوە وای ڕوون دەکەینەوە کە هەرکەس بە نەختێ وردبوونە تێی بگاو فامی کات.

سەرەتا دەبێ ڕاستەقینەی دوستی فام بکرێ کە چییە. واتای خۆشەویستی مەیلی سروشتیە بەشتێ کە خۆشە، گەر ئەوحەزە بەهێز بێ، پێی دەڵێن ئەڤین. دوژمنایەتیش بێز و ڕقی سروشتیە لە شتێک کە ناخۆشە، لەو شوێنەی کە خۆش و ناخۆش نەبێ، دۆستی و دوژمنیش نییە.

هەنووکە دەبێ بزانی کە خۆش چییەک؛ بزانە کە هەرشتێک لە ئاست تۆدا دەبێتە سێ کەرت: کەرتێکیان لەگەڵ تەبعت سازن و تەنانەت تەبع خۆی داوایان دەکا، ئەوەی لەگەڵ سروشتت سازە پێی دەڵێن خۆش، بڕێکیان دەگەڵ تەبع سازو تەبا نین و بە ئاوەژووی ویستی سروشتن، بەوە دەڵێن ناخۆش، ئەوەش کە نەسازەو نە ناساز، نەخۆشی پێدەڵێن و نە ناخۆش.

ئێستا دەبێ بزانی کە تا شتێ نەناسی، نە پێت‌خۆشەو نە ناخۆش. ناسینیش بە گوێرەی هەست و ئاوەزە. هەستەکان پێنجن و هەریەکەیان چێژێکیان هەیەو بە هۆی ئەو چێژەوە خۆشیان دەوێ، واتە تەبع ڕوویان تێ دەکا. چێژی هەستی بینایی ڕوومەتی جوان و مێرگ و ئاو و جۆگەو کانیاو و شتی وایە؛ بۆیە ئەمانەی خۆش دەوێ. گوێ بە دەنگی ڕێکوپێک و خۆش حەز دەکا، هەستی بۆن‌کردن چێژ لە بۆن و بەرامەی خۆش دەبا، هەستی‌چەشتن لە خواردنی خۆش چێژ دەبا، هەستی‌ساوینیش لە هەر شتی نەرم و نۆڵدا چێژو حەز دەبا، هەموو ئەمانە خۆشەویستین. واتە تەبع حەزیان لێ دەکا. هەموو ئاژەڵێک لەمەدا وەکوو یەکن.

هەستی شەشم شتێکە لە دڵدا کە هەم ئاوەزی پێ دەڵێن هەم چاوی دڵ و هەمیش ڕووناکی، یاخۆ هەرزاراوەیەکی‌تر کە پێت خۆشە. بە کورتی ئەو شتەیە کە مرۆڤ لە ئاژەڵانی‌تر جیادەکەنەوە. ئەمیش هەندێ شت هەست پێ دەکا کە خۆشن و خۆشیانی دەوێ، هەروەک ئەو چێژەکانی‌تر کە بەرهەستەکانی‌تر دەیبەن و پێیان خۆشە. لەم سۆنگەوە بوو کە پێغەمبەر فەرمووی: سێ شتیان لە

دونیا کردۆتە دۆستم: ژن و بۆن و بەرامەی خۆش و ڕوونیای چاوم لە نوێژایە. پلەی زۆرتری دایە نوێژ. ئەو کەسەی لە ئاستی چوارپێیانـدا بـێ و ئاگـەداری دڵ نـەبێ و بێجگـە هەسـتەکانی چیـدی نەزانێ، قەد باوەڕ ناکا کە نوێژ خۆشەو دەکرێ خۆشیان بوێ. ئەوەی ئاوەزی بەسەردا زاڵ بووبـێ و لـە دانستەی چوارپێیان دوور کەوتبێ، دیداری جوانی بینایی چاوان و دەسکردە سـەیرو سـەمەرەکانی و گەورەیی و شان‌وشکۆی زات و دانستەکانی پەروەرندەی لە سەیرو دیتنی کانیاو و مێـرگ و ڕوومـەتی جوان خۆشتر دەوێ، تەنانەت لە کاتی سەیری سیمای بینایی چاواندا ئەوانـەی لـە بـەرچـاو سـووک و بێ‌نرخ دەبن.

**شرۆڤەی هۆکانی خۆشەویستی،** تا لەوێوە خویان بێ کە تەنیا پـەروەردگار شـیاوی خـۆش‌ویـستنەو بەس.

**هۆی یەکەم** ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی خۆش دەوێ و گەشەی خۆی خۆش دەوێ و مانەوەی خـۆی خۆش دەوێ و فەوتانی خۆی بە دوژمن دەزانێ؛ هەرچەن نەمانێکی بێ‌ڕەنج و ئـازار بـێ. جـا بـۆچی خۆشی ناوێ؟ چونکە هۆی خۆش‌ویستنەکەی سازگاری دەگەڵ تەبعە، چ شتێ سازو تەباترە لـە بـوون و مان و ژیان و گەشەی دانستەکانی؟ هەروەها چ شـتێک نەسـازتر و ناتـەباترە لـە نـەبوون و نـەمانی گەشەو دانستەکانی؟ کەواتە، بۆیە باب منداڵی خۆی خۆش دەوێ چونکە ژیانی ئەو بە درێـژەی ژیـنی خۆی دەزانێ، چونکە بوونی هەتاهەتایی بۆی نالوێ، ئەوەی بە لەونێ لـە بـوونی خـۆی دەکـا خۆشـی دەوێ و لە ڕاستیدا خۆی خۆش دەوێ.

هەروەها ماڵ‌وسامانی خۆش دەوێ. چونکە هۆیەکە بۆ مانەوە و ژینی خـۆی و تایبەتمەندییـەکانی. خزم و کریڤانی خۆش دەوێ چونکە بە پەڕوباڵی خۆی دەیانزانێ و خۆی بەوانەوە بە تەواوتر دەزانێ.

**هۆی دووەم،** چاکەکارییە. چونکە هەرکەس چاکەی لەگەڵ کردبێ، بە گوێرەی سروشت، ئـەمیش ئەوی خۆش دەوێ. لەم سۆنگەوە گوتوویانە «اَلاِنسانُ عَبیدُالاِحْسانِ». پێغەمبـەر گـوتی: «پەروەرنـدەم! ئیزن مەدە هیچ خراپکارێک چاکەم دەگەڵ کا، چونکە ئەوسا دڵم خۆشی دەوێ» واتـە، چونکـە ئەمـە سروشتی مرۆڤە و بەزۆر ناگۆڕدرێ. لە ڕاستیدا ئەمـەش هـەربۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە مـرۆڤ خـۆی خۆش دەوێ. چونکە چاکە ئەوەیە کە کارێک بکا کە ببێتە هۆی مانـەوە یـان گەشـەی دانـستەکانی. مرۆڤ تەندروستی خۆش دەوێ، بەبێ هیچ هۆیەک، پزیـشکی خـۆش دەوێ چونکـە تەندروسـتی بـۆ پێک دێنێ. هەروەها بە بێ هیچ هۆیەک خۆی خـۆش دەوێ، بۆیـە هەرکەسـە چاکـەی دەگـەڵ کـا خۆشی دەوێ، تەنیا لەبەر چاکەکردن.

**هۆی سێهەم** ئەوەیە کە مرۆڤ، چاکە کاری خۆش دەوێ هەرچەند چاکەشی دەگەڵ وی نەکردبێ. گەر کەسێک بژنەوێ کە لە رۆژاوادا خونکارێکی چاکەکار، زاناو دادوەر هەیەو خەڵک لە بەختی حەوانەتەوە، تەبعی حەزی پێ دەکا، هەرچەند بزانێ چجار رێی ناکەوێتە ئەوێ و ئەو چاکەیە بەر ناکەوێ.

**هۆی چوارم** ئەوەیە کە بە بێ هیچ چاوەنوارییەک مرۆڤی جوانخاسی خۆش دەوێ، تەنیا لەبەر جوانییەکەی و هیچیتر. چونکە جوانی لە تەبعی مرۆڤدا حەز لێکراو بەردڵانە. هەروەها رەوایە کە کەسێک مرۆڤێکی جوان چاکی بەدەوی خۆش بوێ بە بێ شاوەت؛ هەروەک چۆن حەز لە شینایی و ئاو و کانیاو دەکاو مەبەستی خواردنی نییە، بەڵکوو چاوە کە بەهرە لەو جوانییە دەبا. خوشیکی و جوانی حەز لێکراوەو گەر جوانی پەروەردگار لە کەسێک ئاشکرا بێ، هیچ کێشەیەک لەسەر خۆشەویستنی نامێنێ. واتای جوانی پەروەردگار دواتر راڤە دەکرێ.

**هۆی پێنجەم**، بەهۆی دۆستایەتیوە بەندیوارییەک لە نێوان تەبعی دوو کەسدا هەیە کە لەو سۆنگەوە دوو کەس یەکتریان خۆش دەوێ، نەک تەنیا لەبەر چاکی یان جوانی. هەندێ جار ئەم بەندیوارییە ئاشکرایە، وەکوو منداڵ کە هۆگری منداڵ دەبێ، بازاڕی حەز لە بازاڕی دەکا و زانا بەزاناو بە گشتی هەرکەس هۆگری هاوڕەگەزی خۆی دەبێ؛ هەندێ جاریش ئەم پێوەندییە بەرپیوارەو لە سەرەتای فیترەت و هۆکارگەلی ئاسمانیدا بە سەریاندا داسەپاوەو پێوەندییەک پێکهاتووەو کەس لێی تێناگا. هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «ألْأرْواحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ فَما تَعارَفَ مِنها ائْتَلَفَ وَمَا تَنا كَرَمِنْها اخْتَلَفَ»، واتە: گیانەکان پێکرا ئاشنا یان بیانین، گەر لە بناوانەوە ئاشنایی و هۆگری لە نێویاندا پێک هاتبێ، ئەم ئاشنایەتییە بریتیە لەو پێوەندییەی کە پێک هاتووەو راڤە ناکرێ.

## شرۆڤەی ئەوەی کە راستەقینەی چاکە چییە

بزانە ئەو کەسەی کە پتر پاڵی داوەتە لای چوارپێیانەوەو بێجگە لە هەستی بینایی چاو چیتر نازانێ، رەنگە بڵێ جوانی تەنیا رووی سوورو سپی و تەکووزی و رێکی ئەندامانەو ئەمانەش بە هۆی رەنگ و رواڵەتەوەن و ئەوەی بیچم و لەونی نەبێ ناتوانێ جوان و بەدەو بێ، ئەمەش هەڵەیە. زانایان دەڵێن ئەم خەتە جوانە، دەنگێکی خۆشە و جلکێکی جوانەو ئەسپێکی بەدەوەو خانییەکی خۆشەو باخێکی جوانەو شارێکی لەبارو رێکە. کەواتە واتای جوانی لە هەر شتێکدا ئەوەیە کە ئەو شتە تەواو و لەبارو رێک و گونجاو بێ و پێویستی بە شتێکیتر نەبێ. تەواوەتی لە هەر شتێکدا تایبەت بە خۆیە، وەکوو تەواوی خەت، کە لە گونجاوی و رێک و پێکی پیتەکاندایە، بێ گومان سەیری خەتتی جوان و خانووی جوان چێژی زۆریان هەیە. کەواتە، جوانی تەنیا تایبەت بە روومەت نییە، چونکە هەموو

ئەمانەش بە چاوی سەر دەبینرێن. ڕەنگە کەسێک دان بهمانەدا بنێ و بیانسەلمێنێ، بەلام بڵێ ئەوەی بە چاو نەبینرێ، چۆن جوانێکە؟ ئەمەش نەزانییە. چونکە ئێمە دەڵێین فلانی ئاکاری زۆر جوانە، یان مێرخاسییەکی جوانی هەیە، یان دەڵێین زانست و پارێزکاری پێکرا زۆر جوانن، یان بوێری و دلاوایی پێکەوە بەدەون، پارێزکاری و چاوتێری لە هەموو شتێ جوانترن، کەچی هیچ یەک لەمانە بە چاوی سەر نابینرێن، بەڵکوو دەبێ بە چاوی دڵ و ئاوەز سەیریان بکرێ. لە بەشی کۆشەوەی نەفسی ئەم کتێبەدا گوتمان کە ڕوومەت دووانە: ئاشکرا و پیوار. ئاکاری جوان، ڕوومەتی بەرپیوارەو بە تەبع خۆشەویستە. بەڵگە بۆ ئەمەش ئەوەیە کە شتێکی سەیر نییە گەر کەسێک شافیعی خۆش بوێ؛ تەنانەت ڕەنگە کەسێک ئەبووبەکرو عومەری خۆش بوێ و لەبەر خۆشەویستی ئەم کەسانە سەروماڵی خەلات کا. ئەم خۆشەویستیە بۆ ڕەنگ و بیچم و ڕواڵەت نییە، چونکە ئەم کەسانەی نەدیومو ڕواڵەتیان و جەستەیان بۆتە خۆڵ، خۆشویستنی ئەم کەسانە لەبەر جوانی ڕوومەتی بەرپیواری ئەم کەسانەیەو ئەوەش زانست و پارێزکاری و ڕامیاری و شتی وایە. هەروەها هەر بەم بۆنەوە پێغەمبەرانی خۆش دەوێ. ئەوەی ئەبووبەکری سدیقی خۆش دەوێ، هەر ڕوومەتێکی کە بووبێ بۆی تەوفیرناکا، چونکە بەبۆنەی ئەو دانستەوە خۆشی دەوێ کە پێی بۆتە سدیق. ڕاستی و زانایی بەشێکە لە خودی سددیق کە بەشی دابەش نەکراوی پێ دەڵێن. ئەوە نە ڕەنگی هەیەو نە تەشک[1]. لە لای هەندێ کەس جێگیرەو لە لای برێ کەس نە. هەر دانستەیەکی کە هەبێ تەشک و ڕەنگی بۆ نییە. هەر ئەوەشە کە حەزی لێدەکرێ و خۆشەویستە، نەک پێست و گۆشتی ڕواڵەت. کەواتە، هەرکەس خاوەن ئاوەز بێ، حاشا لە جوانی دەروون ناکاو لە جوانی ڕواڵەتی پێ‌خۆشترە؛ چونکە جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئەوەی کە پێغەمبەرێکی خۆش دەوێ و ئەوەی کە حەزی لە وێنەیەکی سەر دیوارە. تەنانەت کاتێ بیانەوێ منداڵێک کەسێکی خۆش بوێ، باسی چاووبرۆ و قەدوبالای ناکەن، بەڵکوو لەسەر دلاوایی و بوێری و زانایی و دەسەلاتی دەپەیڤن، هەروەها گەر بیانەوێ کەسێک بە دوژمن بزانێ و خۆشی نەوێ، سهێتی دەروونی باس دەکەن، نەک ڕواڵەتی. لەم سۆنگەوە موسوڵمانان ئەسحابیان خۆش دەوێ و رقیان لە ئەبووجەهلە. کەواتە خویان بوو کە جوانی دووانە: ئاشکراو پیوار. جوانی بەرپیوار وەکوو جوانی ڕواڵەت حەزی لێدەکرێ و خۆشەویستە، تەنانەت لە لای کەسێک کە تۆزکاڵی ئاوەز تەکی دابێتە لایەوە خۆشەویسترە.

---

[1] - تەشک: سیما و قەلافەت.

**شرۆڤەی ئەوەی کە شیاوی دۆستایەتی راستەقینە، پەروەردگاری مەزن و بەس**

بزانە، کەس بێجگەلەخودا شیاوی دۆستایەتی و خۆشەویستی راستەقینە نییە. هەرکەس کەسی- تری خۆش بوێ، هۆکەی نەزانییە، مەگین لەو رووەوە کە پێوەندی بە پەروەردگارەوە هەیە، هەروەک خۆشەویستی پێغەمبەر کە خۆشەویستی خودایە، چونکە هەرکەس کەسێکیتری خۆش بوێ، پێغەمبەرو خۆشەویست و دۆستی ئەو کەسەی خۆش دەوێ. کەواتە خۆشەویستی زانایان و پارێزکارانیش لە ریزی خۆشەویستی پەروەردگارە. بەم چەشنە لەم چەمکە تێدەگەی کە هۆکانی خۆشەویستی ببینی.

**هۆی یەکەم،** ئەوەیە کە خۆی و گەشەی خۆی خۆش دەوێ. پێویستی ئەمەش ئەوەیە کە خودای خۆش بوێ، چونکە بوونی مرۆڤو بوونی دانستەکانی و گەشەی وی هەموویان لە بوونی خوداوەیە. گەر لەبەر هێژایی ئەو نەبایە، ئافراندنی ئەمیش هەر نەبوو، گەر بەزەیی ئەو نەبایە بۆ پاراستنی ئەم، قەد نەدەژیا، گەر بەزەیی ئەو نەبایە بۆ ئافراندنی ئەندامان و گەشەی دانستەکانی هیچ شت لە مرۆڤ ناتەواوتر نەبوو. زۆر سەیرە کەسێک لەبەر هەتاو پەنا باتە ژیر سێبەری دارو سێبەری خۆش بوێ، کەچی دارەکەی خۆش نەوێ. هەروەها دەزانێ هەروەکوو چۆن بوونی سێبەر بە دارەوە بەندیوارە، بوونی ئەم جیهانە پان و بەرینەش کە تێیدا دەژین بە پەروەرندەو ئافرێنەریەوە بەندیوارە، چۆن دەتوانێ خۆشی نەوێ، مەگەر ئەوەی نەزانێ. بێشک هیچ نەزانێک پەروەردگاری خۆش ناوێ؛ چونکە خۆشەویستی بەرهەمی زانینە.

**هۆی دووەم** ئەوەیە کە مرۆڤ ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵ دەکا خۆشی دەوێ. لەم سۆنگەوە گەر هەرکەسێک بێجگە لە خودای خۆش بوێ، نەزانییە؛ چونکە کەس نەچاکەی دەگەڵ کردووەو نە دەتوانێ چاکەی لەگەڵ کا تا خودا ئیزنی پێ نەداو پەروەردگاری مەزن چاکەکانی دەگەڵ دەسکردەکانی لە ژمارە نایەن، هەروەک پێشتر لە بەشی رامان و شوکرانەبژێریدا لێکمان دایەوە. بەلام لە نەزانیوە وادەزانی کە خەڵک چاکەیان دەگەڵ کردووی، چونکە کەس ناتوانێ چاکەت لەگەڵ کاو مەگەر ئەوەی خودای مەزن بریکارێک بە سەریدا داسەپێنێ کە بە ئاوەژووی ئەوە نەبزوێتەوە، دەخاتە دڵی کە پاداش و خێرو چاکەو قازانجی دین و دونیای لەوەدایە کە چاکەیەکت دەگەڵ کا تا قازانجێکی دەس کەوێ. کەواتە ئەو کەسە لەبەر مەبەستی خۆی چاکەی دەگەڵ کردی، تۆی کردە هۆیەک بۆ گەیشتن بە پاداشی دوارۆژیان پێداهەڵگوتن و پەسن و تاریفی چاکەو ناوو بانگی چاک دەرکردن. بەلام ئەمە پەروەردگارە کە ئەم چاکەی دەگەڵ کردووی و بە بێ هیچ مەبەست و نیازێک بریکارێکی بەسەر ئەو کەسەدا داسەپاندووە کە پەرای تۆکا.

**هۆی سێیەم** ئەوەیە کە مرۆڤ، کەسی چاکە کاری خۆش دەوێ، هەرچەند لەگەڵ ئەو هیچ چاکەی نەکردبێ. هەروەک ئەوەی گەربڵێن کە لە رۆژاوادا خونکارێکی دادوەر و زاناو دلۆڤان و دلاوا هەیەو لە خەزانەی خۆی بژیوی ژینی هەژاران دابین دەکا و لەو ولاتەدا کەس ناوێری ستەم لە کەسیتر بکا، تۆ بەگوێرەی سروشتت ئەو پادشایەت خۆش دەوێ، هەرچەند رەنگە قەد نەیبینی و هیچ چاکەیەکی نەبینی. بەم بۆنەوە نەزانیە گەر بێجگە لە خوا کەسیترت خۆش بوێ، چونکە چاکەیەک کە پێت دەکا هی ئەوەو لەوەوە پێت دەگا و هەرکەس لە جیهاندا چاکەیەک دەکا، لە سۆنگەی ئەوەوە چاکە دەکا.

هەروەها بەشی خەڵکی لە چاکە چییەو چەندە؟ چاکەی ئەوەیە سەر لە بەری ئافرێندراوانی ئافراندو هەرچی پێویستیان بوو، پێیانی داوەو تەنانەت لەو شتانەی کە پێویست نین و تەنیا بۆ خەملاندن و رازاندنەوەن درێخی نەکردووەو دەستی نەقووچاندووە. ئەم بابەتەت بەم جۆرە لێ خویان دەبێ کە لە مەلەکووتی زەوی و ئاسمانەکان و روەک و گیانداران رامێنی و لە سەیرو سەمەرەکانیان تێفکری و چاکەی لەرادەبەدەری لێت ئاشکرا بێ.

**هۆی چوارەم**: ئەوەیە کە هۆی خۆشەویستی کەسێک جوانی بێ، واتە جوانی واتاکان، وەکوو چۆن شافیعی یان ئیمامێکیتر لە ئیمامی موسوڵمانانی خۆش بوێ، یان عەلی و ئەبووبەکرو عومەری خۆش بوێ، یەکێکیتر هەموویانی خۆش دەوێ تەنانەت هەموو پێغەمبەرانیشی خۆش دەوێ. هۆی ئەمانە، جوانی دانستەکان و زاتی ئەم کەسانەیە. هۆی ئەمەش سێ شتیترە:

**یەکەم** جوانی زانست، چونکە زانست و زانا هێژاو بەرێزن و بۆیە خۆشەویستن. هەرچەند زانستێک هێژاتر بێ، زاناکەی هێژاترو خۆشەویسترە. سەرترینی هەموو زانستان، زانستی پەروەردگارە کە بریتیە لە فریشتەکان، کتیب و نامیلکەو شەریعەتی پێغەمبەران و راوێژی دونیاو مەلەکووت و دوارۆژ. پێغەمبەران و راستبێژان بۆیە خۆشەویستن چونکە لەم زانستەدا دەستێکی بالایان هەیە.

**دووەم**، بە هۆی دەسەلاتە. وەکوو دەسەلاتی ئەم کەسانە بۆ چاک و پاککردنی نەفسی خۆیان و رێنمایی بەندەکانی پەروەردگارو بەرێوەبردنی کاروباریان و ئابوورانی ژیانی خەڵکوخوا.

**سێیەم** بە بۆنەی پاکی و بێخەوشی لە هەرچی عەیب و کەمایەسی و نزمی و پیسی ئاکارە. خۆشەویستی ئەم کەسانە لەبەر ئەم دانستانەیە نەک کردەوەکانیان. چونکە هەر کارێک کە بە هۆی ئەم دانستانەوە ئەنجام درابێ زۆر پەسند کراو نییە، وەکوو کارێک کە بە هەڵکەوت یان لەپڕ رووی دابێ. کەواتە هەرکەس لەم دانستانەدا تەواوتر بێ، خۆشەویسترەو هەر بەم بۆنەیە کە بۆ وێنە سددیقیان لە شافیعی خۆشتر دەوێ و پێغەمبەریان لە سددیق زۆرتر خۆشدەوێ.

هەنووکە سەیری ئەم سێ هۆیە بکەو بزانە پەروەردگار شیاوی خۆشەویستی هەیەو ئەم دانستانەی

هەیە یان نە. چونکە هیچ دڵڕاستێک نییە کە نەزانێ زانستی هەموو مرۆڤەکان و فریشتەکان لـە چـاو زانستی خوادا زۆر کەموکورت و بـێنرخـەو بـە هـەمووی گوتـووە کـە ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾[1]. بەڵکوو گەر سەرلە بەری خەڵکوخوا کۆوە بن و لە هۆزانی و بەردەباری ئافرانـدنی میـشوولەیەک یـان مێرووله‌یەک رامێنن، تێیناگەن، تەنیا ئەوەی لێ دەزانـن کـە بـە خۆیـشیان دراوە، هـەروەک گـوتی: ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ ۝ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ﴾[2]. هـەروەها زانـستی هـەمووان کـەلوکوتـەرەو هـی پـەروەردگار بـێ سنوورە، لەگەڵ چ شتێک لە پێوانە دەدرێ؟ زانیاری خەڵکی هی ئەوەو زانستی ئەو هی خەڵک نییـەو هی خۆیە، کەواتە هەموو زانستێک هی ئەوە. بەڵام گەر سـەیری هێـزو خوسـتیش دەکـەی، ئـەویش دڵخوازو خۆشەویستە. بەم بۆنەوە موسوڵمانان بـوێری و ئـازایی عـەلی و ژیـری و کـارزانی عومـەریان پێخۆشە، چونکە ئەمەش جۆرێک لە هێزو دەسەڵاتە. هێـزی خەڵـکی لـە چـاو هێـزی خـودا چییـە؟ تەنانەت هەموو خەڵکی لە ئاست خوادا بێ هێزو ورەن و هەر ئەوەندە نـەبێ کـە خـوا هێـزی پێـداون. دەسەڵاتداری بێڕەقیب هەر ئەوەیە کـە ئاسمانـەکان و زەوی و ئـەوەی تێیدایـە بـە دەسـتی پـڕ لـە دەسەڵاتی ئافراندو دەسەڵات و توانی بێ ڕادەیە.

کەواتە چۆن رەوایە کەسیتریان بێجگە لە ئەو بە بۆنەی هێزو ورەوە خـۆش بـوێ؟ یەکـەم ناتـەواوی مرۆڤ ئەوەیە کـە بەندەیـەو بـوون و ژیـنی لـە دەسـت خۆیـدا نییـە، بەڵـکوو ئافرێنـدراوی دەسـتی کەسێکیترە، چ کەم و کورتییەک پتر لەمەیە؟ هەروەها لـە دەروونی خۆیـشی بـێ ئاگایـە، چ بگـا بـە شتیتر، چونکە گەر دەمارێک لە مێشکیدا لار ببێتەوە، شێت دەبێ و خۆیشی هـیچ ئاگـای لـێ نییـە، تەنانەت رەنگە دەرمانەکەشیان لە پێشی رانابێ و پێی نەزانێ. گەر نەزانی و ناتوانییەکانی بژمێـری کـە چەندن، زانین و توانی لە ئاست ئەوانـدا ئێجگـار کـەمن، هەرچـەن سـددیق یـان پێغەمبـەریش بـێ. کەواتە ئەوە لە کەموکوڕی پاکژە کە زانستی بێرادەو سنوور بێ. زانـستی خـوای مـەزن بـێ رادەیـەو هیچ نەزانییەک رێی تێ نابا. هێزو دەسەڵاتی تەواوە، چونکە ئاسمانـەکان و زەوی لـە ژێـر رکێفدایـەو گەر نووکوبەدی گیانداران بکوژێ، هیچ لـە گـەورەیی و پادشـاییەکەی کـەم نابێتـەوەو گـەر بیـەوێ دەتوانێ سەدهەزار زانایتر لە یەک کاتوساتدا بخولقێنێ و تۆزکاڵێک بە گەورەیی زێدە نابێ، چونکـە زێدەبوونیش رێی تێ نابا. لە کەل و کوتەری پاک و بێخەوشـە، چونکـە نـەبوون رێ ناباتـە نێـو زات و دانستەکانی ئەو، تەنانەت هیچ کەمایەسییەک بۆ ئـەو بـووز نـاخوا. کەواتـە، هەرکـەس ئـەمی خـۆش نەوێ، یاخۆ کەسیتری خۆش بوێ، ئەوە لەو پەڕی نەزانیدایە. ئەم خۆشەویستیە تەواوترە لـەوەی کـە لە سۆنگەی چاکەوە دێتە دی، چونکە ئەوەی بە هۆی چاکەوە بێ، بە کەم و زۆربوونی چاکـەوە کـەم و

---

١ - قورئان، ٨٥/١٧) ئێوە کەمێکتان لە زانست پێدراوە. (هـ)

٢ - (قورئان، ٣/٥٥ و٤) مرۆی ئافراند، لە ئاخافتنی تێگەیاند. (هـ)

زۆر دەبێ. بەڵام کە خۆشەویستیەکەی بە بۆنەی ئەمەوە بوو، لە هەموو دۆخێکدا تەواو و بەرزە. بەم بۆنەوە بوو کە وەحی هاتە سەر داوود کە «ئەی داوود! خۆشەویستترینی بەندەکانم لە لای من ئەو کەسەیە کە منی نە بەبۆنەی ترس یان تەماوە خۆش بوێ، تەنانەت گەر ئەوەی شیاوی پەروەردندەیی منە بە جێی هێنابێ». لە زەبووردا هاتووە کە «کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە منی لەبەر بەهەشت و دۆژەهەوە خۆش بوێ، گەر بەهەشت و جەحەندەمم چا نەکردایە، شیاوی پەرستن نەبووم؟»

**هۆی پێنجەم** لە خۆشەویستیدا پێوەندییە. مرۆڤیش پێوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ پەروەردگار هەیە، قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي[1]. ئاماژەیەکە بەم پێوەندییە. هەروەها «إنَّ الله خَلَقَ آدَمَ عَلی صُورَتِه» هێمایە بەم راستیە. هەروەها ئەمەش کە گوتی: بەندەم لێم نزیک دەکەوێتەوە تا خۆشیم بوێ و ببمەوە گوێ و چاو وئینجا زمانی؛ ئەمەش کە گوتی: «مَرِضتُ فَلَمْ تَعُدْنِي یاموسی»، نەخۆش کەوتم نەهاتیتە سەردانم، ئەی مووسا! گوتی: «تۆ خودانی جیهانی و لە هەرچی زیانە بە دووری، چۆن نەخۆش دەکەوی؟» گوتی: «ئەی مووسا! فلان بەندەی من نەخۆش بوو، گەرسەردانی ئەوت کردایە، سەردانی منت کردبوو». باسی لێکچوونی مرۆڤ و پەروەرندەی لە سەرەتای ئەم کتێبەدا تا رادەیەک لێک درایەوەو شرۆڤە کرا، بەڵام واتاکانیتر لە پەرتووکدا باس ناکرێن، چونکە ئاوەز و فامی زۆربەی خەڵکوخوا تێی ناگەن، تەنانەت ژیر و هەڵکەوتەی زۆر لەم چۆڵەدا رێیان لێ تێک چوو؛ هەندێکیان تووشی گومان و لێلی هاتن، چونکە وایانزانی کە روومەت بێجگە لە روومەتی رواڵەتی نییە؛ هەندێ تووشی دۆنادۆن و یەکەتی هاتن. تێگەیشتنی هەموو ئەمانە ئەستەمە. مەبەست لەم باسە ئەوە بوو کە لە هۆکانی خۆشەویستی گەیشتی، دەبێ بزانی هەر خۆشەویستیەک، بێجگە لە خۆشویستن خودا لە نەزانیەوە بە دڵدا دێ و لەم سۆنگەوە ساویلکەیی کەلاموانت لێ ئاشکرا دەبێ کە گوتی: مرۆڤ تا شتێ لە ماکی خۆی نەبێ ناتوانێ خۆشی بوێ، چونکە ئەویش لە ماکی ئێمە نییە ناتوانین خۆشمان بوێ. کەواتە واتای خۆشەویستی گوێرایەڵی و فەرمانبەرداریيە. چونکە ئەم بێ ئەنوا لە خۆشەویستی تەنیا خۆشەویستی ژنانی فام کردووە. بێ شک شاوەت پێویستی بەهاوجنسیە، بەڵام ئەم خۆشەویستیەی کە ئێمە باسمان کرد جوانی و تەواوی واتای دەوێ نەک هاوجنسی رواڵەتی. چونکە ئەوەی پێغەمبەری خۆش دەوێ بەم بۆنەوە نییە کە ئەویش وەکوو ئێمە سەرو روو و دەست و پێی هەیە، بەڵکوو پێوەندییەک لە واتادا هەیە؛ چونکە ئەمیش وەکوو ئەو زیندوو و زاناو مریدو بێژەرو بیسەرو بینەرەو ئەم دانستانە لەودا تەواون. بنەمای ئەم هۆوانە لێرەشدا هەیە، بەڵام

---

١ - (قورئان، ٨٥/١٧) بێژە: گیان هەر لەوانەیە کە پەروەرندەم دەیزانێ. (هـ)

جیاوازی لە تەواوی و تایبەتمەندییەکاندا لە رادەبەدەرە. هەرچی مەودای تەواوی و ناتەواوی پتـر بـێ، خۆشەویستیش زۆرتر دەبێ، بەلام نابێتـە هـۆی دابـڕانی ئـەو خـۆش‌ویـستنەی کـە بـە بۆنـەی ئـەو پێوەندییانەوە لە نێواندا پێک هاتووە. هەمووکەس ئەم رادە لە پێوەنـدی دەناسـن و دانی پێـدا دەنـن، هەرچەند لە نهێنی و راستەقینەی ئەم پێوەندییە کـە «انَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ عَلَی صُورَتِه» بـاس لـەوە دەکـا تێناگەن.

## شرۆڤەی ئەمەی کەهیچ خۆشییەک وەکوو خۆشی دیداری پەروەردگار نییە

ئەمە لە زماندا ڕێبازی هەموو موسولمانانە، بەلام کـە لـە خۆیـان بپرسـن کـە «دیـتنی شـتێک کـە نەخاوەنی شوێنە و نە بیچم و ڕەنگی هەیە، چ خۆشـییەکی هەیـە؟» نـازانن؛ بـە زمـان دەڵـێن لەبـەر ترسی ئەوەی کە لەشەرعدا هاتووە، کەچی لە دڵـدا هـیچ تامازوویـیـەکیان نییـە، چونکـە ئـەوەی کـە نایناسن چۆن بۆی تامازرۆ بن؟ هەرچەند شرۆڤەی ئەم نهێنییە لە ئاوەها پەرتووکێکدا ئەسـتەمە، بـەلام بە هێمایەکی کورت نەختێ ڕوونی دەکەینەوە:

ئەمە چوار بنەمای هەیە: یەکەم ئەوەی کە دەبـێ بـزانی دیـداری پـەروەردگاری مـەزن لـە هـەموو شتێ خۆشترە. دووەم ئەوەی کـە دەبـێ بـزانی ناسـینی پـەروەردگاری مـەزن لـە هـەرچی ناسـینە خۆشترە. سێیەم دەبێ بزانی کە بە دەستهێنانی زانست دڵ تەژی لـە چێـژو خۆشـییەک دەکـا کـە چاو و لەش هیچ بەشێکیان تێدا نییە. چوارەم ئەوەیە کە دەبێ بزانی خۆشـییەک کـە تایبـەت بـە دڵ بێ، لە هەرچی خۆشی چاو وگوێ و بەرهەستەکانیترە بە هێزترو زاڵـترو خۆشـترە. کـە ئەمانـەت لـێ خویان بوو دەزانی کە هیچ شت لە دیداری بینایی چاوان خۆشتر نییە.

**بنەمای یەکەم** ئەوەیە کە بزانی ئارخەیانی دڵ لە ناسینێکدایە کە لەش هیچ چێژێکی لێنابا.

بزانە کە لە مرۆڤدا هێزگەلێکیان ئافراندووەو هەریەکەیان بۆ کارێک تەرخان کردووە و نیـازی تـەبعی مرۆڤ هەرئەوەیەو خۆشی و چێـژی مـرۆڤ لـەو شـتەدایە کـە نیـازی سروشـتیە. هـەروەکوو هێـزی تووڕەیی کە بۆ زاڵبوون و تۆڵەسەندنەوە ئافرێندراوەو حـەزو خۆشـی لەوەدایـە؛ هێـزی شـاوەتیان بـۆ دابین‌کردنی خۆراک و بژیـو خولقانـدووەو چێـژی لەوەدایـە؛ هێـزی بیـستن و دیتنـیش بـەم پێیـە هەڵسەنگێنەو هەریەکەیان چێژێکیان هەیە. ئەم خۆشـییانە جیـاوازن، چونکـە خۆشـی تـوخنی ژنـان کەوتن لەگەڵ تووڕەیی جیاوازە؛ هـەروەها لـە ڕادەی توانیـشیاندا جیـاوازن، هەنـدێکیان بـەهێزترن، وەکوو خۆشی چاو کە بە دیتنی شتگەلی جوان کەیفخۆشتر لە کـەپـۆ دەبـێ کاتـێ بـەرامـەیـەکـی پێدەگا. لە دڵی مرۆڤیشدا هێزێک چێ کراوە کە پێی دەڵێن «ئاوەز» یـان «ڕوونـاکی»، بـۆ ناسـین و زانینیان ئافراندووەو لە هەست و خەیاڵ و دالغەدا ناگونجێ و سروشـتی هەروایـە؛ خۆشـی ئـەم هێـزە

لەوەدایە کە سەر لە رازو نهێنی ئافراندنی ئەم دونیایـە دەربکـاو بزانـێ کـە پێویـستی بـەراوێژکارێکی هۆزان و بلیمەت و زاناو توانا هەیە. هەروەها دانستەکانی پەروەردگار و ژیرییەکانی لە ئافراندندا بزانـێ. ئەمانەش لە هەست و خەیاڵدا ناگونجن، بەڵکوو بەم هێزە لە دەسکردە ورد و باریکەکان دەگاو فێریـان دەبێ، دانانی بناغەی ئاخافتن و کتێب و هیندسەو زانستگەلی وردو باریـک. لـە هـەموو ئەمانـە چێـژ دەبا، تەنانەت گەر بە بۆنەی زانستێکی کورت و بچوکیشەوە پەسنی بکەن، زۆری کـەیفخۆش دەبـێ و گەر بە نەزانی تاوانباری بکەن، پێی زیز دەبێ. چونکە زانستی تەواوی خۆی دەناسێ. تەنانەت گەر لـە لای شەترەنجبازێک دابنیشێ و هەرچەند پێی بڵێن هیچ مەڵـێ و یارمـەتی هـیچ لایـەنێـک مـەدەو رێنومایی مەکە، ناتوانێ بەر بە خۆی بگرێ؛ چونکە لەبەر چێژێک کە لەو رادە زانیاریە بێ فـەرە دەیبـا، ناوێری هیچ نەڵێ و خۆی پێ نەنوێنێ. زانست تایبەتمەنـدی پـەروەردگارەو چ شـتێ لـە لای مـرۆڤ خۆشتر لـەوەیـە؟ هـەروەها چ کـەماڵـێک بـەنرخترە لـە کـەماڵـێک کـە لـە سـۆنگەی دانـستەکانی پەروەردگارەوە پێک بێ؟ کەواتە تێگەیشتی کە دڵ لە زانین چێژی زۆر دەبـا، بـەبێ بەشـداری چـاوو لەش لەم چێژەدا.

**بنەمای دووەم** ئەوەیە کە بزانی چێژو خۆشی زانین -کە هی دڵە- لە چێژو خۆشی هەسـتەکانیتـر بە هێزترە.

زۆر هەیە کەسێک خەریکی یاری شەترەنج دەبێ و دەیدۆڕێنێ و لەبەر زیزی هیچـی پـێنـاخورێ و گەر زۆریش برسی بێ و پێی بڵێن شتێک بخۆ، ناخوا و درێژە بە یارییەکەی دەدا تا بەڵـکوو تـەنانـەت جارێک یارییەکەی بباتەوە. ئەمە بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی چێژی ئەو یارییـەلـە چێـژی خـواردن زۆرتـرەو لەم سۆنگەوە بایەخی زۆرتری دەداتێ و خواردنەکـەی وەدرەنـگ دەخـا. کەواتـە بـەم چەشـنە رادەی چێژێک لە ئاست چێژێکیتردا دەزانین کە گەر هەر دوویان پێکڕا کۆوە بـن، ئـەوەیـان کـە گرینگتـرە وەپێشتر دەخرێت و ئەوەیان کە نرخ و بایەخی کەمترە دەخرێتە دواوە.

کە لەم باسە گەیشتی، ئەمە بزانە کە هەرکـەس ژیرتـرو بـەفامتر بـێ، چێـژو خۆشـیگەلی دەروونی بەسەردا زاڵترە، چونکە گەر مرۆڤێکی ژیرو زانـا سەربەسـت بـێ لـە نێـوان ئـەوەی کـە یـان باقلـەواو مریشکی سوورەوکراو بخوا، یان کارێک ئەنجام بدا کە ببێتە هـۆی سـەرکەوتنی بەسـەر نەیارێکـدا یـا ببێتە سەرۆک، بێ گومان ئەو کارەی کە ببێتـە هـۆی گـەورەیی و پێشەوایی هەڵـدەبژێرێ، مـەگین ئەوەی کە هێشتا مژی باش نەمەیبێ و خۆی نـەگرتبێ و پێنەگەیـشتبێ. کەواتـە، ئـەوەی کـە هـەم بتوانێ لە خواردن چێژ بباو هەمیش گەورەیی، گـەورەیی هەڵـدەبژێرێ و چێـژی زۆرتریـشی لێـدەبا. هەروەها زانایەک کە ژمێریاری دەخوێنێ، یان خـەریکی هیندسـە یـا زانـستی شـەرعە، گـەلێک لـەو زانستەی دەحەسێتەوەو گەر باش پێگەیشتبێ، قەد لەگەڵ دەسەڵاتی ناگۆڕێتەوە؛ مەگین ئـەوەی لـە

زانستدا ناتەواو و کەل و کوتەر بێ و باش لە خۆشیەکەی نەگەیشتبێ. کەواتە بەم پەیڤە ئاشکرا بوو کە چێژی زانست بەسەر هەموو چێژێکی‌تردا زاڵە، ئەڵبەتە بۆ کەسێک کە ناتەواو و پێنەگەیو نەبێ و هەموو چێژێکی تێدا هەبێ. کاتێ منداڵێک خۆشی گوێزان لەگەڵ چێژی هاونوێنی دەگەڵ ژنان نەگۆڕێتەوە، هیچ سەرمان سووڕ نامێنێ، چونکە دەزانین شاوەت هێشتا لە منداڵدا هێزی نەگرتووە؛ کە هێزی گرت، ئەوسا خویان دەبێ کە لە نێوان دوو خۆشیدا کامیان هەڵدەبژێرێ.

**بنەمای سێهەم** ئەوەیە کە ناسینی پەروەردگاری مەزن لە هەموو زانستەکانی‌تر خۆشترە.

کە تێگەیشتی زانست و زانیاری خۆشترە، ئەمەشت لێ خویان دەبێ کە بڕێ لە زانستەکان خۆشترن، چونکە هەرچەن بابەتی زانست هێژاتر و گەورەتر بێ، زانستەکەی خۆشترە؛ زانستی بنیاتنان و دانانی شەترەنج، خۆشتر لە یاری شەترەنجە؛ زانستی بەڕێوەبردنی وڵات لە زانستی وەزیری خۆشترە، زانستی وەزیری لە زانستی زەڕگەری خۆشترە، زانینی واتاکانی شەرع و نهێنیەکانی خۆشترە لە زانستی وشەوانی، هەروەها سەردەرکردن لە نهێنیەکانی کاری وەزیر خۆشتر لە زانینی کاری خەڵکی بازاڕە، زانینی نهێنیەکانی پادشا لە نهێنیەکانی وەزیر بەنرخترە. کەواتە هەرچەند بابەتی زانست هێژاتر و بەرزتر بێ، زانینەکەشی خۆشترە. جا خۆت رامێنەو بزانە لە سەرلەبەری بووندا تشتێک هەیە هێژاترو مەزنترو گەورەترو بەرزترو بەشانوشکۆتر لە ئافرێنەری هەموو گەورەیی و هێژاییەکانی دونیا؟ هەروەها هیچ خونکارێک هەیە کە کاروباری وڵاتەکەی بەتەکووزی ئەو پادشایە جێبەجێ بکا؟ هیچ کەس هەیە بە دەوترو جوانترو گەورەتر لەو بێ؟ کەواتە چۆن دەبێ سەیری کەسێکی‌تر پتر لە سەیری ئەو خۆشتر بێ؟ هەرچەند بۆ کەسێک کە چاوی دیتنی ئەو جوانیەی بێ، یان ئاوەزی فامکردنی ئەو گەورەییەی بێ. یاخۆ زانستی نهێنی چ وڵاتێ پتر لە زانینی نهێنیەکانی وڵاتی ئەو خۆشترە؟

کەواتە، ئاشکرا بوو کە ناسینی پەروەرندەی مەزن و زانینی دانستەکانی و ناسینی مەلەکووت و وڵاتی وی و گەیشتن لە نهێنیەکانی خودایی وی لە هەموو ناسینێک خۆشترو بەچێژترە. چونکە بابەتی ئەم زانستانە لە هەمووان هێژاترە؛ تەنانەت گوتنی هێژاتر خۆی هەڵەیەکی زەق و ئاشکرایە؛ چونکە هیچ شتی‌تر نییە کە شیاوی ئەوە بێ دەگەڵ ئەو لە پێوانە بدرێ و پێی بڵێ هێژاو بەمیش بڵێن هێژاتر. کەواتە: خواناس لەم جیهانەدا هەردەم لە بەهەشتێکدایە کە عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ[1]، بگرە لەوەش فرەتر بێ؛ چونکە پانتای ئاسمان وزەوی سنووردارە، کەچی زانست بێ‌کەوشەنە. هەروەها بێستانێک کە سەیرانگای خواناسە تخووبی بۆ نییە، کەچی زەوی و ئاسمان ئەو

---

١ ـ (قورئان، ١٣٣/٣) هەراوی بەقەدەر زەوی و ئاسمانەکانە.

پەڕیان دیارە؛ ئەو میوەگەلە کە لەم بێستانەدان، نە بڕانەوەیان بۆ هەیەو نە زیانیان تێدایە، بەڵکوو بەردەوامن و قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ[1] یە، چونکە چ شتێ نزیکتر لەوشتەیە کە زاتی خۆیە؟ هەروەها کێشەو ئاژاوەو رژدی و چنۆکی ڕێی تێ نابا، چونکە هەرچەند خوانەناس پتر بن، هۆگری و دۆستایەتیان فرەترە. ئاوەها بەهەشتێکە کە بە زۆربوونی خەڵکەکەی هیچ جێگایان تەنگ نابێ، بەڵکوو هەراوترو فراوانتر دەبێ.

**بنەمای چوارەم** ئەوەیە کە خۆشی سەیرکردن و دیتن زۆرتر لە خوشی ناسینە.

بزانە، زانیاری دووکەرتن: کەرتێکیان ئەو شتانەن کە لە داڵغەدا دەگونجن، وەکوو ڕەنگ و روو. کەرتێک ئەوانەن کە ئاوەز پێیان دەگاو لە داڵغەدا ناگونجن، وەکوو پەروەردگارو دانستەکانی. تەنانەت بڕێ لە دانستەکانی خۆت، وەکوو هێزو زانست و ویست و ژیان؛ چونکە ئەمانە چۆنیەتیان نییەو لە خەیاڵدا ناگونجێن، تەنانەت تووڕەیی و خۆشەویستی و شاوەت و ئارخەیانی و شتی لەم چەمکە، ئەمانەش چەندوچوونیان نییەو خەیاڵ ڕێیان تێ نابا، کەچی ئاوەز لە هەموویان دەگا.

هەرچی لە خەیاڵدا بگونجێ، بە دوو جۆر تێی دەگەی: **یەکەم** ئەوەی کە لە داڵغەتدا ئامادە دەبێ، وەکوو ئەوەی کە سەیری دەکەی؛ ئەمەش ناتەواوە. دووەم ئەوەی کە دێتە پێش چاوت و ئەمەیان تەواوترە. دیداری خۆشەویست گەلێک لە خەیالی خۆشترە؛ نە بەم بۆنەوە کە دیتن لە روومەتێک جیاوازتر و بەدەوتر چێژ دەبا، بەڵکوو هەمان روومەتە، بەڵام روونتر. وەکوو ئەوەی کە ژوانی گراو لە چاشتەنگاودا خۆشتر لە بەرەبەیانە؛ نەبەم بۆنەوە کە روومەت دەگۆڕێ و جوانتر دەبێ، بەڵکوو بە بۆنەی ئەوەوە کە روونتر و راشکاوترە.

هەروەها هەرچی لە داڵغەدا نەگونجێ و بە ئاوەز تێی بگەی، ئەوەش دووجۆرە: **یەکەم** پێی دەڵێن زانین؛ **ئەویتر** کە لە سەرووی زانستدایە، پێی دەڵێن دیدارو دیتن. ڕێژەی ئەمە لەگەڵ زانین، بەراشکاوی وەکوو ڕێژەی دیتنە دەگەڵ خەیاڵ. هەروەکوو چۆن پێلووی چاو پەردەیەکە لە بەرانبەر دیتن نەک خەیاڵکردن، تا هەڵنەهێنرێ ناتوانێ ببینی؛ وەکوو پێوەندی مرۆڤە دەگەڵ ئەم لەشەی، کە پێکهاتووە لە ئاو وخاک، پەرژانە سەر شاوەت و ئارەزووەکانی ئەم دونیایە پەردەیەکە لە هەمبەر دیتن نەک زانست. تا ئەم پەردە لانەبرێ ناتوانی جیهانی سەروو و ڕاستەقینەی ببینی. لەم سۆنگەوە بە مووسای ع قَالَ لَن تَرَانِي[2]. کەواتە، چونکە دیتن روونتر وتەواوترە، بێگومان چێژیشی زۆرترە؛ هەروەکوو دیدارو خەیاڵ. بزانە ڕاستیەکەی ئەوەیە کە هەر ئەم زانستەیە کە لە دواڕۆژدا ئاڵ و وێرێکی

---

١ ـ (قورئان، ٢٣/٦٩) میوەی وا لەبردەستایە. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ١٤٣/٧) گوتی ناتوانی بمبینی.

بەسەردادێ کە هیچ لەمەی ئێستای ناکا، وەکوو تنۆکێک کە دەبێتە مرۆڤ و ناوکە خورمایەک کە دەبێتە دارێکی پڕ بەرو گەورە. ئەوەش پێی دەڵێن سەیرکردن و دیدار.

دیدار بریتییە لە تەواو بوونی هەستەکان، ئەم دیدارەش تەواوتربوونی ئەم هەستەیە[1]؛ بەم بۆنەیە کە ئەم دیدارە نییە لە گیرۆدەی شوێن و رەهەندا، وەکوو زانین لەم دونیایەدا نییە لە بەندی شوێن و رەهەندا. کەواتە، تووی دیدار، زانینە. هەروەها هەرکەس زانیاری نییە، دیداری پەروەردگاری بۆ هەتاهەتا لێ قەدەغەیە، چونکە هەرکەس تووی نەبێ هیچ ناچێنێ و هیچیش نادروێنێ؛ ئەوەش زانستی تەواوتر بێ، دیداری تەواوترە. کەواتە پێت وانەبێ سەرجەمی خەڵکی یەک جۆر دەبینن، بەڵکوو دیتنی هەرکەس بە قەدەر زانستیە. «وَاِنَّ اللهَ يَتَجَلّٰى لِلناسِ عَامّةً وَلابي بَكْر خاصّةً»[2]، هەر ئەمەیە، نەک ئەوەی کە خەڵکی پێکڕا دەیبینن و ئەبووبەکر بە تەنیا خۆی، بەڵکوو ئەو شتەیە کە خۆی دەیبینێ و خەڵک نایبینن، چونکە تایبەت بەمەو ئەوە هەمان تووی زانینە کە خەڵکیتر نەیانبوو. هەروەها ئەوەش کە فەرمووی: «سەرتری و هێژایی ئەبووبەکر بە بۆنەی نوێژو رۆژووی زۆرەوە نییە، بەڵکوو بە بۆنەی نهێنییەکە لە دڵیدا چێنراوە». ئەو نهێنییە چەشنێ زانستەو تووی ئەو دیدارە تایبەتەیە. کەواتە هەرچەند پەروەردگار یەکە، بەڵام هۆی ئەم جیاوازییە لە بینیندا وەکوو ئەو وێنەیە کە لە چەن ئاوێنەی جیاوازدا دیارە: هەندێ گچکەیەو هەندێ گەورە، بڕێکیان روونترن و بڕێ لێلترن، تاقمێکیان خێچن و تاقمێ راستن، تەنانەت هەندێکیان لە خواریدا دەگەنە ئاستێک کە جوان و بەدەو بە کرێت و دزێو پیشان دەدەن. وەکوو ئەوەی کە روومەتی کەسێک لەسەر پانایی شمشێردا سەیرکەی و ئەو کەسە هەرچەن خوشیک بێ، بەڵام بە سەهێتی پێت پیشان دەدرێ. ئەوەی کاتی کۆچی بەرەو جیهانی هەرەمانەوە ئاوێنەی دڵی لێڵ یان خێچ بێ، ئەوەی کە دەبێتە هۆی ئارخەیانی کەسانیتر، دەبێتە هۆی ئازارو سزای ئەم. کەواتە، پێت وانەبێ ئەو چێژەی پێغەمبەران لە دیداری خودای دەبەن، خەڵکیتریش دەیبەن؛ ئەوەی زانایان دەیبەن خەڵکی رەمەکیش دەیبەن؛ ئەوەی زانایانی پارێزکار دەیبەن زانایانیتریش دەیبەن. جیاوازی نێوان زانایەک کە ئەویندار خودایە، دەگەڵ زانایەک کە ئەڤیندار نییە، لە چێژێکە کە لە دیداردا دەیبا، نەک لە خودی دیدار؛ چونکە هەردوویان کەسێک دەبینن، چونکە تووی دیداری هەردوویان زانینەو هەردوویان بەرانبەرن. وەکوو دووکەس کە سەیری رووی جوانکیلەیەک کەن، هەردووکیان وەک یەک دەیبینن، بەڵام چونکە یەکێکیان هۆگرو ئەویندار ئەو روومەتەیە پتر چێژی لێ دەبا؛ یان گەر هەردووکیان ئەویندار بن، ئەوەیان کە ئەویندارترە چێژی زۆرتری لێ دەبا. کەواتە، زانین بە تەنیا بۆ گەیشتن بە بەختەوەری

---

[1] ـ واتە تەواوتر بوونی زانستە کە لەو دونیا دەبێتە دیداری پەروەردگار. (وەرگێر)

[2] ـ پەروەردگار بە جۆرێکی گشتی خۆی بە خەڵک دەنوێنێ و بە جۆرێکی تایبەت خۆی بەئەبووبەکر پیشان دەدا.

بەس نییە، بەڵکوو دەبێ لەگەڵ ئەو زانینە خۆشەویستیش ئاوێتە بێ، ئەم خۆشەویستییەش بەوە پێک‌دێ کە خۆشەویستی دونیا لە دڵ پاکژ کەیتەوە. ئەمەش بە پارێزکاری و پارسایی دێتە ئەنجام. کەواتە زانای پارێزکار چێژی زۆرترە.

سەرنج - **جیاوازی چێژی دیدار لەگەڵ چێژی ناسین**

رەنگە بڵێن گەر چێژی دیدار وەکوو چێژی زانینە، چێژێکی زۆر سەرنجڕاکێش و ئەوتۆ نییە. هۆی ئەم پەیڤەت ئەوەیە کە لە چێژی زانست بێ‌ئاگای، رەنگە چەن وتەیەکت کۆوە کردبێ و فێریان بووبێتی و ئەوە بە زانست بزانی. ئاشکرایە کە هیچ چێژێک لەوە نابەی. ئەوەی نان وتش دەخواو پێی وایە باقلەوایە، هیچ چێژێک لە باقلەوا نابا. بەلام ئەوەی لە راستەقینەی زانست گەیشتبێ، ئەوەندە پێی خۆشە و چێژی لێ دەبا کە لەم دونیایەدا بەهەشتی پێبدەن، دەگەڵی نایگۆڕێتەوە. هەروەکوو چۆن مرۆڤی ژێر و خاوەن ویر، خۆشی خونکاری لە چێژی زگ و ژێر زک خۆشتر دەوێ. بەلام هەرچەن زانست گەلێ خۆشە، کەچی ناگاتە قولەپێی دیتندا و ئەمە تەنیا بە وێنەیەکی ئاشکرا خویان دەبێ: بیر لە ئەڤینداڕێک بکەوە کە لە کازیوەدا سەیری دولبەرەکەی دەکا، لە هەرەتێکدا کە ڤیانەکەی کەل و کوتەرەو شاوەتیشی لاوازە؛ هەروەها دووپشک و زەردەواڵە تێی ئالاون و پێوەی دەدەن و خەم و کەسەری زۆریش لە دڵی ئاخنراوە و لە هەموو تشتێکیش دەترسێ، بێگومان چێژی ئەم کەسە زۆر کەمە؛ بەلام گەر لە پرونەکاو هەتاو هەڵبداو دووپشک و زەردەواڵە لێی دوورکەونەوەو خۆشەویستی وشاوەتی زۆر بێتەوە و دڵی لە هەرچی دەردو کەسەرە بخەلسێ، ئەوسا چێژێک دەبا کە قەد دەگەڵ ئەوەی پێشوو هەڵناسەنگێندرێ. بارودۆخی زانا لە دونیا ئاوەهایە و تاریکی وەکوو لاوازی زانینە لەم دونیایە کە وەکوو ئەوەیە لە پشت پەردەیەکەوە بنوارێ؛ هەروەها کەل و کوتەر بوونی خۆشەویستی بە بۆنەی ناتەواوبوونی مرۆڤە لەم دونیایە، کە تا لەم دونیایەدا بژی لە ڤیاندا ناتەواوە؛ دووپشک و زەردواڵە، شاوەت و خەم و کەسەری دونیان. هەموو ئەمانە کۆسپی رێگای چێژی زانینن؛ دڵەراوکێ و ترس و گومان وەکوو بیری ژین و بژیو و خەمی نانەو بەمردن هەمووی ئەم ئاستەنگانە هەڵدەگیرێن و لادەبرێن. ئەوین و ئارەزووی دیتنی پەروەردگار کاتێ دەگاتە بەرزترین ئاستی کە خەم و پەژارەو دڵەڕاوکێی دونیا نەمێنێ و لەم سۆنگەوە ئەم چێژە تەواوتر دەبێ. وەکوو چێژێک کە برسی لە بۆنی خواردن دەیبا، قەد نابێتە وەکوو خواردنی ئەو خۆراکە، چێژی دیدارو زانین ئاوەهان.

سەرنج- **چاوی دوارۆژ وەکوو چاوی دونیا نییە**

رەنگە بڵێی زانین لە دڵایەو دیتن لە چاو، چۆن وادەبێ؟ بزانە دیـتن بۆیـە پێـی دەڵـێن دیـتن کـە مەبەست تەواوتربوون و گەشەی خەیاڵە، نەک ئەوەی کە لە چاودایە؛ چونکە گـەر دیـتن لـە جەمینـدا بایە، دیسان هەردیتن بوو. کەواتە باس لە شوێنی دیتن فزوولیە. چونکە کە بێژرا دیتن و چاو شـوێنی دیتنە، دەبێ دڵنیابی کە لە دوارۆژدا چاو لە دیتن بێ بەش نابـێ. هـەروەها دەبـێ بـزانی کـە چـاوی دوارۆژ وەکی چاوی دونیا نییە؛ چونکە ئەم چاوە لە شوێن و رەهەندا دەبینێ، کەچی ئـەو چـاوە ئـاوڕ لە شوێن و رەهەند ناداتەوە. فرەتر لەمە ئیزن نەدراوە کە بۆ خەڵکی رەمـەکی روون بکرێتـەوە و باسـی لێ بکرێ، چونکە ئەمە لە هێزی تێگەیشتنی ئەو بەدەرە؛ ئەم هەویـرە ئـاوی زۆر دەبـا. هـەروەها هـەر زانایەک کە لەسەر فیقەو حەدیس و شروڤەی قورئان رەنجی کێشاوە، لەم چەمکەدا رەمەکییـەو هـیچ نەزان، تەناتەت ئەوەی کە کەلامەوانە، لەم باسەدا رەمەکییە. چونکـە کـەلاموان پاسـەوان و چـاوەدێری باوەڕی خەڵکە، تا ئەوەی خەڵکی رەمەکی باوەڕیان پێیـە، ئـەم بەحـەدیس بـۆی بپـارێزێ و بەشـەڕە قسە، مێملی داهێنەری لێ دووردەکاتەوە. بەڵام زانین کۆڵانێکی‌ترەو خەڵکەکەی تاقمێکی‌تـرن. چونکـە ئەم باسە لەم پەرتووکەدا ناگونجێ، چاتر وایە لێرەدا بیبڕینەوەو درێژەی پێ نەدەین.

سەرنج- **چۆن دەتوانین بگەین بە چێژو خۆشی خۆشەویستی پەروەردگار**

رەنگە بڵێی ئەو چێژەی کە خۆشی بەهەشتی تێـدا بـزر دەبـێ بـۆم قـووت ناچـێ؛ هەرچـەن لـەم بابەتەدا زۆر باس کراوە، بەڵام چار چییە؟ تا هەست بەو چێژە نەکەین، ناتوانین زۆرمان بـاوەڕ پـێ‌بـێ. دەرمانی ئەمە چوار شتە:

**یەکەم،** دەبێ لە مەڕ ئەو شتانەی کە بێژران زۆر رامێنی و بیرکەیتەوە تا لێت ئاشکرا بێ، چونکـە بـە جارێک بیستنی پەیڤێ بەتەواوی تێی ناگەی.

**دووەم** ئەوەیە کە بزانی چێژو شاوتیان بە یەکجار لە مـرۆدا نەخولقانـدووە. بەڵـکوو منـداڵ سـەرەتا شاوەتی خواردنی هەیەو بێجگە لەوە چیدی نازانێ؛ کە بوو بـە حـەوت سـاڵان شـاوەتی یـاری‌کـردن سەرهەڵدەداو بۆ یاری‌کردن رەنگە خۆراکەکەی بەجێ بێڵێ؛ کە بوو بە دە سـاڵان پێـر لـە خـواردن و یاری کردن، حەز بە خۆ رازاندنەوەو جل‌وبەرگ و خشڵ دەکا؛ کە بوو بە پازدە سـاڵ مـەیل بـە ژنـانی دەبزوێ و هەموو ئارەزووێکی دەبێتە نزیکی لەگەڵ ژن؛ کە بوو بە بیستسـاڵ، ئـارەزووی گـەورەیی و سەرۆکایەتی و فیزو خۆهەڵکێشان لـە ناخیـدا سـەر هەڵـدەدا و ئەمـە دوایـین پلـەی خۆشـییەکانی دونیایە، هەروەک پەروەردگار لە قورئانـدا فـەرمووی: أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ

وَتَكَاثُرٌ فِي ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ[1]. گەر حەز و مەیلی دونیا بە تەواوی دڵ و دەروونی دانەگرێ و لەنێو خۆیدا نەیتوێنێتەوە، پاش ئەمە چێژی ناسینی جیهان و ئافرێنەری جیهان و تێگەیشتن لە رازو نهێنییەکانی مەلەکووت و دونیا لە دڵیدا چێ دەبێ و چۆن هەرچی دواتر دێ، پێشترەکان لە چاو ئەوەدا سووک و بێنرخن، ئەمەش کە دوایین چێژە، لە هەموویان خۆشترو هێزاترە. چێژی بەهەشت پتر لە چێژی چاو و سک و ژێر سک نییە؛ چونکە بەهەشت گوڵستانێکە کە تێیدا سەیران دەکاو خۆراک دەخوا و لە مێرگ و جۆگەو رووباری خەنی دەبێ و بەردەوام سەیریان دەکا. ئەمە شاوەتێکە کە هەر لەم دونیایەدا لە چاو سەرۆکایەتی و گەورەیی ئاستێکی نزمتری هەیە، چ بگا بە زانین و ناسین؛ چونکە پارێزکار هەیە کە خۆی لە دەیرێکدا زیندانی دەکاو هەر رۆژ بە قەدەر دانەیەک نۆک خۆراک دەخوا، لە بەرتەمای شان‌وشکۆ و رەزامەندی خەڵک و چێژی ئەمانە. کەواتە، ئەم کەسە چێژی شان‌وشکۆ و ناوودەنگی پتر لە بەهەشت خۆش دەوێ، چونکە بەهەشت بێجگە لە خۆشی زک و ژێر زک و چاونییە. پاشان چێژوخۆشی شاوەتی شان‌وشکۆ کە هەموو خۆشییەکی‌تری شاردەوە، خۆی لە چێژی زانیندا بزر دەبێ. تۆ کە هەموو ئەمانەت تاقی کردۆتەوەو پێیان گەیشتووی، باوەڕت بەم پەیڤە هەیە، کەچی منداڵێک کە پێنەگەیوە، بڕوای پێ نییەو گەر بتەوێ چێژی گەورەیی و سەرۆکایەتی بۆ خویان بکەی، ناتوانی. زانای شارەزا وەکوو تۆ لەهەمبەر ئەو منداڵە کە دۆش‌داماوی، لە ئاست تۆدا دادەمێنێ و ناتوانێ تێت بگەیێنی. بەڵام گەر نەختێ ژیری و ئاوەزت هەبێ و لەمەدا تێفکری، لێت ئاشکرا دەبێ.

**سێیەم** ئەوەیە کەسەیری بارودۆخی خواناسان کەی و گوێ لە پەیڤیان بگری؛ چونکە نێرمەۆک هەرچەند لە شاوەتی نووستن دەگەڵ ژنان بێئاگایە، بەڵام کە دەبینێ خەڵکی هەرچییان هەیە بۆ ئەو کارەی خەرج دەکەن، راستیەکی بۆ دێتە دی، ئەوەش ئەوەیە کە خەڵکی چێژو شاوەتێکیان هەیە جیا لەو چێژەی ئەو هەیەتی.

رابعە ژنێک بوو کە باسی بەهەشتیان دەگەڵی دەکرد، گوتی: «اَلْجارُ ثـمَّ الـدّارُ» سەرەتا خودانی خانوو، پاشان خانوو.

ئەبووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «پەروەردگاری مەزن، بەندەگەلێکی هەیە کە ترسی دۆژەەو هیوای بەهەشت لە یادی خودایان ناپرینگێنێتەوە، دونیا چۆن دەتوانێ بە خۆیەوە خەریکیان کا؟!»

یەکێک لە برادەرانی مەعرووفی کەرخی گوتی: «پێم بڵێ بزانم ئەوە چییە وا لە خەڵکی دایبڕیوی

---

[1] ـ (قورئان، ٢٠/٥٧) ژی لەدنیایە هەر گەمە و بادی هەوایە و بۆ خۆ بەجوان نیشاندان و خۆ لەسەر یەکتردانان و فرەبوونی عەولاد و داراییتانە. (هـ)

و پەنات بردۆتە کونجێک و خەریکی عیبادەتی، ترسی مردنە، ترس لە قەبرە یان دۆژەە، یاخۆ هیـوا بـە بەهەشتە؟» گوتی: «ئەمانە چین؟ خونکارێـک هەیـە کـە ئەمانـەی هـەمووی لـە ژێـر رکێفایـە، گـەر دۆستایەتی ئەو بچێژی هەموو ئەمانە لە بیر دەکەی و گەر ناسـیاوی و ئاشـناییەتیت دەگەڵـی هـەبێ، ئاوڕدانەوە لەوانەت زۆر پێ شوورەییە».

بێشەری حافییان بە خەو بینی، پێیان گوت: «ئەبوو نەسری تەممار و عەبـدولوەههابی وەڕڕاق لـەچ دۆخێکدان؟» گوتی: «هەرئێستا لە بەهەشـتدا بـەجێیانم هێـشت، خـۆراکی بەهەشـتیان دەخـوارد». گوتیان:«ئەی تۆ؟» گوتی: «پەروەردگار زانی کە هـیچ مـەیلێکم بـە خـواردن و خواردنـەوە نییـە، بـە دیداری خۆی شادی کردمەوە».

«عەلی کوڕی موەفەق» دەڵێ: «بەهەشتم بە خـەوبینی، خەڵـکێکی زۆر خـەریکی خـواردن بـوون، فریـشتەکان لـە هـەموو خـواردنێکی پاکژیـان دەنایـە سـەر زاریـان. یـەکێکم بـینی لەبـەر شـوێنی پیرۆزدا[1] سەری هەڵبڕیبوو و دەینواڕی. بە بەهەشتم گوت: «ئەمە کێیە؟ » گـوتی: «ئـەوە مـەعرووفی کەرخییە کە نە بە هیوای بەهەشت و نە لە ترسی دۆژەەعیبادەتی کردووە؛ بۆیە ئێـزنی سـەیرکردنیان پێ داوە؟»

ئەبووسلەیمانی دارانی دەڵێ: «هەرکـەس ئەمـڕۆ بپەرژێتـە سـەرخۆی، لـە پەسلانیـشدا هەروایـە و هەرکەس ئەمرۆژ بپەرژێتە سەر پەروەرندەی خۆی، لە پەسلانیشدا هەروا دەپەرژێتە سەرخوا».

یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێ: «شەوێک بایەزیدم بینی کە لە پاش نوێژی خەوتنان تا نـوێژی بـەیانی لەسەر دووپای دانشتبوو، پاژنەی نەختێ هەڵبڕیبوو و بەرەو سەر دەیڕوانی. لەدواییدا کڕنۆشێکی بـردو زۆر راوەستاو گوتی: «پەروەرندەم! هەندێ تۆیان ویست کەرامەتت پێیان داو بەسەر ئـاودا دەڕۆیـشتن و لە ئاسماندا دەفڕین، من لەوانـە هانـا دەبەمـە بـەرت؛ نەختینـەی ژێـر خاکـت دایـە هەنـدێ و بـۆ هەندێکیش ئەو هێزەت پێ دان کە بە شەوێک مەودایەکی دووردرێژ ببڕن، لە هـەموو ئەمانـە هانـات پێ دەبەم. هەڵگەڕایەوەو منی بینی. گوتی: یەحیا تۆ لێـرەی؟ گـوتم: بەڵـێ. گـوتی: لـە کـەنگێوە؟ گوتم: لە مێژە. گوتم: لەم سەربهوردە شتێکم پێ بڵێ. گـوتی: ئـەوەی بـۆت دەشـێ پـێتی دەڵـێم: منیان بە سەروووخواری مەلەکووتدا گەڕاند، گاسیان کردم کە "هـەرچیت پێخۆشـە داوا کـە تـا پـێتی بدەم". گوتم: "لەم هەمووە هیچم ناوێ". گوتی: "بەڕاستی کە تۆ بەندەی خۆمی"».

«ئەبووتورابی نەخشەبی» مریدێکی بوو، بەردەوام لە خۆیدا رادەما. جارێک ئەبوو توراب پێـی گـوت: «زۆر چاکە کە سەردانی بایەزید کـەی». گـوتی: «کـارێکم بـە بایەزیـدەوە نییـە». چـەن جـاریتـر پێیگوت: مرید گوتی: «من پەروەردگاری بایەزید دەبینم، چم داوە بەسـەر بایەزیـدەوە؟» ئـەبووتوراب

---

[1] ـ شوێنی پیرۆز: حضیرة القدس.

گوتی: «گەر جارێک ئەبایەزید ببینی، باشترە لەوەی کە حەفتاجار خودای بایەزید ببینی». مرید پێی سەیر بوو، گوتی: «چۆن؟» گوتی:«ئەی بێ ئەنوا! تۆ کە خودا دەبینی بە قەدەر خۆت، خۆیت پێ دەنوێنێ، بەڵام بایەزید کە لە لای خودای دەبینی، بە قەدەر ئەو دەیبینی». مرید تێگەیشت، گوتی با برۆین. دەڵێ: «رۆیشتینە لای، لە بێشەلانێکدا بوو، لەسەر بەرزاییەک دانیشتین تا هاتەدەر، کەڵپۆسێکی بە ئاوەژووی کردبووە بەر؛ مرید کە سەیری کرد، نەعرەتەیەکی کێشاو دەم و دەس مرد. گوتم: «ئەی بایەزید! روانینێک و کوشتنێ؟» گوتی: «نە، ئەم مریدە راسبێژ بوو، نهێنییەکی لە دڵدا بوو، هێزی ئاشکراکردنی نەبوو، کە منی بینی لێی ئاشکرا بوو، بەڵام توانی کەم بوو، هێزی پێ نەشکاو مرد».

هەروەها بایەزید گوتی: «گەر دۆستایەتی ئیبراهیم و سکالای مووساو رۆحانییەتی عیسای پێ دای، مەگەرێوە و پێیرازی مەبە، بێجگە ئەوانەش شتگەلێکیتر هەیە».

بایەزید برادەرێکی بوو کە ئامۆژگاری پادشای دەکرد، بە بایەزیدی گوت: «سی ساڵە بە شەو نوێژ دەکەم و بە رۆژ رۆژووم، بەڵام ئەوانەی کە تۆ دەیڵێی هیچم لێ خویان نەبووە». گوتی: «گەر سێسەد سالیش بیکەی هیچ نابینی». گوتی: «بۆچی». گوتی: «تۆ خۆت پەردەی خۆتی». گوتی: دەرمانی چییە؟ گوتی: پێت ناکرێ. گوتی: بڵێ تابیکەم. گوتی: نایکەی. گوتی: تۆ بڵێ دەیکەم. بایەزید گوتی: «هەر ئێستا برۆ بۆ لای سەرتاش با ردێنت بتاشێ. رووت بەرەوە و فۆتەیەک بە کەمەرتدا ئاڵێنەو توورەکەیەک پڕ لە گوێز دەملت رایەڵ کە و بێرە نێو بازاڕ. هاوار کە و بڵێ هەرکەس شەپلاخەیەکم تێ بسرەوێنێ، گوێزی دەدەمێ. هەروا برۆرە لای دادوەرو ئامۆژگارانی شار». کابرا گوتی: «سُبحانَ اللّه! ئەمە چییە دەیڵێی؟» بایەزیدی گوتی: «بەمەی کە گوتت سُبحانَ اللّە ئامبازت بۆ خوا دانا، چونکە ئەوەت بۆ رێزگرتن لە خۆت گوت». گوتی: «ئەمەم پێ ناکرێ، شتێکیترم پێ بڵێ». گوتی: «یەکەم دەرمانی تۆ هەر ئەمەیە». گوتی: ناتوانم. گوتی: «من گوتم کە ناتوانی». ئەمەی بەم بۆنەوە گوت چونکە ئەو کابرا پەرای خۆی دەکردو لووتبەرزی و فیز و دەماری خۆی بەهێز دەکرد و تەنیا رێی چارەی هەر ئەمە بوو.

لە خەبەردایە کە وەحی هاتە سەرعیسا کە «کاتێ سەیری دڵی بەندەم کەم و نە خۆشەویستی دونیای تێدا بەدی کەم، نە دوارۆژ، خۆشەویستی خۆمی تێدا دەچێنم و خۆم چاوەدێری لێ دەکەم». ئیبراهیمی ئەدهەم گوتی: «پەروەرندەم! خۆت دەزانی کە بەهەشت لە لام بە قەدەر باڵی تۆفانەیەک لە چاو خۆشەویستی خۆت کە لە دلمدا چاندت و حەزێک کە بۆ عیبادەتی خۆت پێت دام، نرخی نییە». بە رابیعەیان گوت: «پێغەمبەرت چەند خۆش دەوێ؟» گوتی: «گەلێک زۆر، بەڵام خۆشەویستی پەروەردگار هەڵی بادانەوە بۆ لای بەندەکانیم پێ نادا». لە عیسایان پرسی: «لە

عیبادەتەکان کامیان بە نرخترە؟» گوتی: «دۆستی پەروەردگارو سەرنەوی‌کردن لـە هەمبـەر ویـستی ئەو».

بەکورتی لەم سەربهوردانە زۆرن و بـە گـوێرەی ئەمانـە لێـت خویـان دەبـێ کـە خۆشـی ناسـین و دۆستایەتی پەروەردگار لە چێژی بەهەشت گەلێک زۆرترە، دەبێ چاک لەمانەدا رامێنی.

## شرۆڤەی هۆی پیواربوونی ناسینی پەروەردگاری مەزن

بزانە، نەناسینی هەر شتێ دوو هۆی هەیە: **یەکەم** ئەوەیە کە رەنگە ئەو شتە پیوارو نادیارو لـێڵ بـێ؛ دووەم رەنگە ئەو شتە ئەوەندە روون و دیار بێ کە چاو توانی دیتنی نەبێ، بەم بۆنەیـە کـە شەمـشەمە کۆرە بە رۆژ نابینێ و بەشەو دەبینێ، نە لەو سـۆنگەوە کـە شـەو روونـاکترو ئاشـکراترە، بەڵـکوو هـۆی ئەوەیە کە رۆژ ئەوەندە روون و ئاشکرایە کە چاوی لە بـەری هەڵـنایە. کەواتـە هـۆی دژواری ناسـینی پەروەردگار لەبەر رووناکییە، چونکە ئەوەندە روونە کە دڵەکان دەروسـتی نایـەن. ئاشـکرایی و دیـاری پەروەردگار دەبێ بە هەڵسەنگاندن بناسی. گەر خەتێک ببینی کە نووسراوە، یان بەرگێکی جـوان کـە دووراوە، هیچ شت لە لات روونترو ئاشـکراتر لـە هێـزو وزەو زانـین و زینـدوویی و ئـیرادەی نووسـەرو بەرگدوور نییە. کردەی ئەم کەسانە ئەم دانستانەی دەروونیان دەنوێنێ. گـەر پـەروەردگار لـە هـەموو جیهان بە تەنیا مەلێک یاخۆ روەکێکی چێ بکردایە، هەرکەس سەیری دەکرد، تـەواوی و گـەورەیی و زانست و شان و پلەو هێزایی ئافرێنەری ئەوانەی بـە بـێ رامـان لـێ خویـان دەبـوو؛ چونکـە ئەمـە لـە تایبەتمەندییەکانی نووسەرو بەرگدوور ئاشـکراترە. بـەلام چونکـە هـەرچی لـە بووندایـە، لـەئاسمان و زەوی و گیاندارو روەک و بەردو خاک و هەرچی لە بیرو خەیاڵدا دەگونجێ، بە یـەک دەنـگ شـایەتی لەسەر گەورەیی و زانایی و مەزنی ئافرێنەریان دەدەن. لەبەر زۆری و راشکاوی ئەم بەڵـگانە، بـەرپیوارو نادیارن؛ چونکە گەر هەندێکیان دەسکردی ئەو بایەن و هەنـدێکیان هـی کەسـێکیـتر ئاشـکراتر بـوو، بەلام چونکە هەمووی هی ئەوەو بە یەک دەنگ باس لە یەک شت دەکەن، پیوار دیارە. بۆ وێنـە هـیچ شت لە هەتاو روونتر نییە کە هەموو شت بە هۆی ئەوەوە دیارە، بەلام گەر هـەتاو بەشـەو ئـاوا نەبوایـە، یان بە هۆی سێبەرەوە دانەپۆشرایە کەس نەیدەزانی کە لـەسـەر زەویـدا رووناکییـەک هەیـە؛ چونکـە بێجگە لە سپی و کەسک و رەنگیتر شتێکیتری نەدەدی، دەیـانگوت لـەم رەنگانـە بـەو لاوە چیـدی نییە. کەواتە ئەمەی کە تێگەیشتن روونایی شتێکی جیاواز لە رەنگەکانەو رەنگەکان بـە هـۆی ئـەوەوە دیارن، لەوەدا کە بەشەو ئەم رەنگانە دادەپۆشرێن و لە سـێبەردا پیـوارتر لـە بـەر هـەتاون. کەواتـە بـە هۆی دژیەوە (سێبەرو تاریکی) هەتاویان ناسی. هەروەها گەر ئافرێنـەریش نـەبوون و شـراوەبوونی بـۆ بلوایە، ئاسمان و زەوی تێک دەچوون و تەفروتوونا دەبوون؛ ئەوسا بە ناچار دەیانناسـی. بـەلام چونکـە

هەموو ئافرێنداران لە شایەتیدا یەک دەنگن، ئـەم شـایەتییەش بـەردەوام و ئێجگـار ڕووناکـە، لەبـەر ڕووناکی بەرپیوار دیارە.

هۆیەکی‌تر ئەوەیە کە مرۆڤ کە چاوی کردۆتەوە هەموو ئەمانەی دیـوەو خـووی پێیـان گرتـووەو لـە پێش چاوی ئاسایی بوونەتەوە، پاش ئەوە فـام و ئـاوەزی پێگـەیوەو ئاشـکرایە کـە مـرۆڤ خـووی بـە شتێکەوە گرت کەمتر بیری لـێ دەکاتـەوەو تێیـدا رادەمێنـێ، مـەگین ئـەوەی ڕوەک یـان ئـاژەڵ و گیاندارێکی نامۆ ببینێ، ئەوسا بەبێ ویستی خۆی پەسنی خودا دەکـاو بـە دڵ لـە شـایەتی ئـەو شـتە نوێیە دەگا. کەواتە ئەوەی چاوی کز نییە، هەرچی دەبینێ بەدەسـکردی خـودای دەزانـێ نـەک ئـەو شتە خۆی؛ زەوی وئاسمان بە دەسکردی ئەو دەبینێ، نەک بە هـی خۆیـان. وەکـوو چـۆن کەسـێک خەتێک دەبینێ لەو ڕووەوە سەیری ناکا کە دەواتەو کاغەز، ئەم چەشنە سەیرکردنە هـی ئەوانەیـە کـە خەت نازانن - بەڵکوو بە بۆنەی ڕێکوپێکی و تەکووزییەک کـە نووسـراوە و هەیـەتی سـەیری دەکـا، تەنانەت لەو خەتەدا خۆشنووس دەبینێ، هەروەکوو چـۆن لـە نووسـراودا نووسـەر دەبینـێ. کـەوابوو، سەیری هەرچی بکا شێوەی خودای تێدا بەدی دەکا، چونکە هـیچ شـت نییـە کـە دەسـکردی خـودا نەبێ، بەڵکوو هەموو جیهان نووسراو و دەسکردی ئەون. گەربتەوێ سەیری شتێک کەی کە هـی ئـەو نەبێ و بەرەو ئەونەبێ، ناتوانی؛ چونکە هەموو شتێ بـە زمـانێکی پـاک و پـاراو کـە زمـانی حاڵـی پـێ دەڵێن، شایەتی لەسەر گەورەیی و بەرزی و مەزنی ئەو دەدەن؛ لەمە ڕوونتـر لـە جیهانـدا هـیچ شـت نییە، بەڵام نەزانی خەڵک بە بۆنەی لاوازی و ناتوانییانەوەیە.

## شرۆڤەی چارەی خۆشەویستی

چونکە خۆشەویستی گەورەترین پلەو پاگەیە، ناسینی چـارەی گرینگـە. هەرکـەس بیـەوێ کـە بـە بۆنەی جوانیەکەوە ئەڤیندار بێ، دەبێ لە هـەرچی بێجگـە ئـەوە ڕوو وەگێـڕێ و ئـاوڕ لـە هـیچ شـت نەداتەوەو بەردەوام سەیری ئەو بکا. هەروەها کە ڕووی گراوەکەی دەبینێ و دەست و پا و ئەگریجـەی داپۆشرابێ و ئەوانەش گەلێک جوان بن، دەبێ هان بدا تا ئەوانەش ببینێ و مەیلی زۆرتر بـێ: کـە وای کرد، بێ گومان کەم یان زۆر، حەزێک لە دڵـیدا دێتـە دی. خۆشەویـستی پـەروەردگاریش هەروایـە. یەکەم هەنگاو ئەوەیە کە ڕوو لە دونیـا وەرگێـڕاو بێجگـە لـە خـوا ئـاوڕ لـە چیـدی نەداتـەوەو دڵ لـە خۆشەویستی بێجگە ئەو پاکژ کاتەوە، چونکە دۆستی دەگەڵ بێجگە لە ئەو، دڵ لە خۆشەویـستی ئـەو دوور دەکاتەوە؛ ئەوە وەکوو پاقژ کردنەوەی زەوینە لە بەردو هەرزەگیا. پاشان دەبـێ بیناسـێ؛ چونکـە ئەوەی خۆشی ناوێ هۆی ئەوەیە کـە ناییناسـێ، ئـەگینا هەمووکـەس بـە پێـی سروشـتیان جـوانی و هێژاییان خۆش دەوێ. تەنانەت کەسـێک کـە سـدديق وفـارووق بناسـێ، ناتوانـێ خۆشـیانی نـەوێ،

هەمووکەس بە پێی سروشتی خۆی، ئاکاری بەرزو رەوشتی جوانی ئەوانی خۆش دەوێ.

ناسین، وەکوو چاندنی تووە لـە زەویـدا؛ پاشـان بـەردەوام خـەریکی بیرویـادی ئـەو بـوون، وەکـوو ئاودێرانی ئەو تووەیە، چونکە هەرکەس زۆر یادی کەسێک کا، بێگومان هۆگرییـەک لـە نێوانـدا چـێ دەبێ.

هیچ بڕوادارێک لە بنەمای خۆشەویستی بێبەش نییە، بەڵام جیاوازی لەم سـێ هۆوەدایـە: **یەکـەم** ئەوەی کە رادەی دۆستی و پەرژانە سەر دونیایان جیاوازەو خـۆش‌ویـستنی هەرشـتێک، دۆسـتایەتی شتی‌تر دەشکێنێ. **دووەم** ئەوەیە کە رادەی ناسینیان جیاوازە، بۆ وێنە خەڵـکی رەمـەکی، شـافیعیان خۆش دەوێ چوون دەزانن زانایەکی گەورەیە؛ ئەو مەلایانە کە لە ئاستی بلیمـەتی ئـەو تێگەیـشتوون، زۆرتریان خۆش دەوێ، چونکە زۆرتر دەیناسن؛ موزەنی کە شاگردی بوو لە زۆربەی زانـست و بـارودۆخ و ئاکارەکانی شارەزابوو، پتر لە زانایانی‌تر خۆشی دەویست. کەواتـە هەرکـەس زۆرتـر خـودای ناسـی، زۆرتر خۆشی دەوێ. **سێیهەم** لە زیکرو عیبادەتدا -کە لەو سۆنگەوە هـۆگری چـێ دەبـێ- جیـاوازن. کەوابوو هۆی جیاوازی خۆشەویستی سێ شت بوو. بەڵام ئەوەی کە هیچ خۆشی نـاوێ، هـۆی ئەوەیـە کە هیچی لـێ نازانـێ؛ چونکـە هـەروەک بـە پێـی سروشـت، جـوانی رووومـەت دڵ بزوێنـە، جـوانی دەروونیش هەروایە. کەوابوو، خۆشەویستی بەرهەمی ناسینەو بە دوو چەشن دەتوانین بیناسین:

**یەکەم رێچکەی سۆفییانە،** ئەمانە پاکترینی رۆژگارن و بەردەوام خەریکی زیکرو بـیرو ویـرن و بـەم جۆرە خۆیان و دەروونیان لە خۆیان و هەموو دونیاو بە گشتی هەرچی بێجگە خوایە، پـاکژ دەکەنـەوەو دڵیان لە بیانیان دەسڕنەوە و بەم چەشنە بە هۆی پرشنگ و تیـرێژی گـەورەیی خـوا لـە دەروونیـان، تووشی گۆڕان و ئاڵوویر دێن و وەکوو ئەوەیان لێ دێ کە خودا دەبینن. وێنەی ئەمە وەکـوو نانـەوەی داوە، رەنگە نێچیری تێکەوێ و رەنگە نەکەوێ، تەنانەت رەنگە مشکێک بێتـە داوەوەو رەنگـە بازێـک؛ جیاوازی ئەمە زۆر گەورەیەو بە گوێرەی دەوڵەت و رۆزی دەگۆڕدری.

**رێچکەی دووەم فێربوونی زانستی** مەعریفەیە، نەک زانستی کەلام وشتگەلی‌تـر. دەسـپێکی ئـەم زانستە رامانە لە دەسکردە سەیرو سەمەرەکانی پەروەردگار، هەروەک لە بەشـی بـیر کردنـەوەی ئـەم کتێبەدا ئاماژەمان پێ کرد. پاش ئەوە دەبێ هەڵکشێ بەرەو رامان لە گـەورەیی و جـوانی زاتی خـودا تا راستەقینەی ناوو دانستەکانی لێی خویـان بـێ. ئەمـە زانـستێکی دوورو درێـژە، بـەڵام رێبـوارێکی زیرەک و زانا کە مامۆستایەکی زانا رێنومایی کا دەگاتە ئەم ئاستە؛ مرۆڤی زەیـن کـوێر نایگاتـێ. ئەمـە وەکوو داونانەوە نییە کە رەنگە نێچیر بگرێ یا خۆ نەگرێ، بەڵکوو ئەمە وەکوو پاسـەوانی و بازرگـانی و کەسب‌وکارە. وەکوو ئەوەی کە کەسێک مەڕێک و بەرانێک بکڕێ و بەهۆی جووت‌بوون و سـکـوزایـان

دڵنیابێ لەوەی کە سامانەکەی پتر دەبێتەوە؛ مەگین ئەوەی کە برووسکە لێی بداو تەفروتوونابن.

هەرکەس بە دووی خۆشەویستیدا بگەڕێ، بە بێ ناسین قەد پێی ناگا. هەرکەس بێجگە لەم ڕێچکە بۆ ناسین هەڵبژێرێ، هیچ نابینێتەوە. هەرکەس پێی وابێ بەبێخۆشەویستی پەروەردگار لە پەسلاندا بەختەوەر دەبێ، بەهەڵەدا چووە؛ چونکە بەختەوەری دواڕۆژ جیا لە گەیشتن بە خودا نییە. هەرکەس ئەڤینداری شتێک بێ، بەڵام بەبۆنەی کۆسپ و لەمپەرەوە لێک دابڕابێتن و شەو و ڕۆژ لە یادی ئەو گراوەیدا بێ، کاتێک پێک دەگەن و ئەو مەودایە نامێنێ، زۆر پێکتر شادوشوکر دەبن و بەختەوەری هەر ئەمەیە؛ هەروەها گەر زۆر ئەویندار نەبووبێ و کەمی خۆش ویستبێ، چێژێکی زۆرکەم دەبا. کەواتە بەختەوەری و چێژ بردن بە پێی خۆشەویستی و ئەوینداریيە.

پەنا بە خودا! گەر کەسێک خێی نەدابێتە ناسینی خودا و هۆگری شتێک بێجگە ئەو بووبێ و دڵی پێ ئەسپاردبێ، ئەوەی لە دواڕۆژدا تووشی دەبێ، دژ بە ئەوە و تووشی فەوتان و ڕەنج و ئازاری دەکا. ئەوەی خەڵکی پێی شادوشوکر دەبن، دەبێتە هۆی ئازارو سزای ئەم. وەکوو چاهەڵکێشێ کە بڕواتە نێو بازاڕی عەتر فرۆشان. کە بۆن و بەرامەی خۆش دەگاتە بینی، دەبوورێتەوە. خەڵک وخوا میسک وگوڵاوی لێ دەپژێنن، بەڵام ئەو بەو بۆنانە خراپتر دەبێ؛ تا ئەوەی کە کابرایەک کە پێشتر کاری ئاو هەڵکێشان بووە پێی دەگات، دەزانێ هۆی بوورانەوەکەی چییە، نەختێ پیسایی بە بینیدا دەدا، کابرا دێتەوە سەر خۆی و دەڵێ: ئۆخەی! ئومەتە بۆنی خۆش. کەواتە هەرکەس خێی دایە سەر خۆشییەکانی دونیاو خووی پێیان گرت، وەکوو ئەو ئاوهەڵکێشەی لێ دێ، بەیانی لە دواڕۆژدا کە ئەو چێژە دونیاییانەی لێ دوور دەبێ و ئەوەی لەگەڵ سروشتی ڕێک کەوتووە نابێنێتەوە، وەکوو کابرای ئاوهەڵکێشی لێ دێ کە هەموو شتی لێ نامۆیەو هیچ شاوەتی دونیا لەوا نابینێ و هەرچی دەبینێ دژ بە سروشتی خۆیە. بۆیە هەموو شتێ لەو شوێنەدا هۆی ڕەنج و ئازارن بۆی.

کەواتە دواڕۆژ جیهانی گیانانە، جیهانی جوانی پەروەردگارەو بەختەوەر ئەو کەسە کە هەر لێرەوە تەبعی خۆی دەگەڵ ئەولا ڕێک کردبێ تا سروشتی هاودەنگ بێ لەگەڵ جیهانی ئەولا؛ هەروەها هەموو کۆشەوە و عیبادەت و ناسینێک بۆ ئەم پێوەندییەیەو خۆشەویستی هەمان پێوەندییەو مەبەست لە قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا[1] هەر ئەوەیە؛ هەر ئەوەیە؛ هەروەها سەرجەمی گوناح و هەڵەو شاوەتەکانی دونیا دژ بەم پێوەندییەن، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا[2] باس لەوە دەکا. ئەوانەی وینان و بە چاوی دڵ ئەم واتایانە دەبینن، لە سنووری چاولێکەری و پێڕەوی تێپەڕیون. ئەمەیان لە ڕاستبوونی

---

١ ـ (قورئان، ٩/٩١) دیارە هەرکێ گیانی خاوێن ڕاگرتووە، ڕزگار بووە. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ١٠/٩١) هەرکەسێکیش. دەگوناهیەوە پێچاوە، دۆڕاندوویە. (هـ)

پێغەمبەرییەوە زانیوە، تەنانەت راستی پێغەمبەریشیان بە بێ ئاوڕدانەوە لە پەرجوو[1]، ناسیوە؛ وەکوو کەسێک کە پزیشکی بزانێ و گوێی لە پەیڤی پزیشکێک بێ، بێ گومان دەزانێ کە پزیشکە؛ هەروەها کە گوێی لە پەیڤی بازارییەک بێ کە باس لە پزیشکی دەکا، چادەزانێ کە هیچ نەزانە. کەواتە ئەم کەسە پێغەمبەری درۆینە لە پێغەمبەری راسبێژ جیا دەکاتەوەو دەیناسێ، ئەوەش بە چاوی دڵی خۆی نەیبینێ و نەیناسێ لە پێغەمبەر دەیپرسێ. ئەمە زانستێکی ئاشکرایەو وەکوو ئەو زانستەی کە گۆچان بکاتە ئەژدیها نییەو لێک هەڵاواردنی پەرجوو و سیحر زۆر دژوارە.

## دیاردەکانی خۆشەویستی

بزانە خۆشەویستی گەوهەرێکی هێژاو بە نرخە؛ زۆر ئاسانە هەرکەس خۆی بە ئەویندار بنوێنێ، بەڵام خۆشەویستی نیشانەو دیاردەی هەیە، دەبێ ئەو دیاردانە لە خۆیدا ببینێتەوە، ئەوانەش حەوتن:

**یەکەم**: نابێ مردن بە کرێت بزانێ، چونکوو هیچ ئەویندارێک دیداری خۆشەویستەکەی بە دزێو نازانێ. پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس دیداری خوای مەزنی پێ خۆش بێ، پەروەردگاریش دیداری ئەوی پێ خۆشە». «بویطی» بە یەکێک لە پارێزکارانی گوت: «مردنت پێخۆشە؟» پارێزکار لەوەڵامدا نەختێ راما؛ گوتی[2]: «گەر راسبێژ بوایاتای پێت خۆش بوو». بەڵام رەوایە کەسێک ئەویندار بێ و وەدرەنگ کەوتنی مردنی پێخۆش بێ، نە خودی مردن بە کرێت بزانێ؛ چونکە هەنووکە زادی ڕێگای دابین نەکردووە؛ نیشانەکەشی ئەوەیە کە بۆ ئاburوورانی تۆیشووی بێئۆقرەیە.

**دیاردەی دووەم** ئەوەیە کە هەرچی ویستی خودابێ فەرزی بداتە سەر ویستی خۆیداو ئەوەی دەبێتە هۆی نزیکی لە خودا هەڵیبژێرێ و ئەوەی دەبێتە هۆی دووری، وازی لێ بێنێ هەرچەند زۆریش حەزی لێ بێ. ئەمە کەسێکە بە هەموو دڵیەوە خودای خۆش دەوێ. هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس دەیەوێ کەسێک ببینێ کە بە دڵ و گیان خودای خۆش دەوێ بڵێن سەیری سالم، بەندەی حوزەیفە کە». کەوابوو، گەر کەسێک تووشی گوناح هات، هۆی ئەوە نییە کە هۆگری خودا نییە، بەڵکوو هی ئەوەیە کە بە هەموو دڵەوە هۆگر نییە. بەڵگە بۆ ئەم پەیڤە ئەوەیە کە چەن جار نوعەیمانیان بە بۆنەی مەی خواردنەوە حەد لێدا؛ یەکێک لە لای پێغەمبەرەوە لەحنەتی بۆ نارد، پێغەمبەر فەرمووی: «لەحنەتی لێ مەکەن، چونکە خودا و پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ». هەروەها فوزەیل گوتی: «گەر لێتیان پرسی خودات خۆش دەوێ، بێ دەنگ بە؛ چونکە گەر بڵێی نە، کافری و گەریش بڵێی ئەرێ، کردەوەت لە ئاکاری خۆشەویستان ناکا».

---

[1] - پەرجوو: معجزە.

[2] - بویطی گوتی.

**دیاردەی سێهەم** ئەوەیە کە هەردەم خەریکی یادی خودا بێ و بەبێ زۆر لە خۆکردن، تامازرۆی یادی خودا بێ؛ چونکە هەرکەس شتێکی زۆر خۆش بوێ، زۆریش یادی دەکا، هەروەها گەر دۆستایەتییەکەی تەواو بێ، هیچ لە بیری ناکا. بەم بۆنەوە گەر بە زۆر دڵ دەپەرژێنیتە سەر یادی خودا، ترسی ئەوە هەیە کە خۆشەویستەکەی کەسێکی‌تر بێ، واتە ئەو کەسەی کە هەردەم یادی لە دڵیدایە. رەنگە کەسێک خۆشەویستی خودای بەسەر دڵدا زاڵ نابێ، بەڵام بە دڵ هۆگری دۆستێکی خودابێ، چونکە خودای خۆش دەوێ؛ خۆشەویستی شتێکەو خۆشەویستی خۆشەویست شتێکی‌ترە.

**دیاردەی چوارەم** ئەوەیە کە قورئان -کە پەیڤی خودایە- و پێغەمبەر کە لە لای خوداوە هاتووەو هەرچی پێوەندی بەوەوە هەیە خۆش بوێ. کە خۆشەویستیەکەی هێزی گرت، هەموو خەڵکوخوای خۆش دەوێ، چونکە هەموویان ئافرێندراوی ئەون، تەنانەت هەموو بوونەوەرانی خۆش دەوێ، چونکە دەسکردی ئەون؛ هەروەکوو چۆن کە کەسێکی خۆش بوێ، نووسراو و دێرەکانیشی خۆش دەوێ.

**دیاردەی پێنجەم** ئەوەیەکە هۆگری دۆعاو سکاڵاو تەنیایی بێ وتامازرۆ بێ کە شەوداێ و ئاپۆرەو لەمپەرەکان لابدرێن و لە تەنیاییدا لەگەڵ خۆشەویستی بڕۆنە ژوان؛ بەڵام گەر خەوو ئاخافتنی پێ‌خۆشتر بێ تا شەونخوونی و رازونیاز، خۆشەویستیەکەی لاوازە. وەحی هات بۆ داوود کە: «ئەی داوود! خوو بە هیچ ئافرێندراوێکەوە مەگرە؛ کەس لێم دانابڕێ مەگین دووکەس: **یەکەم** ئەو کەسەی کە بۆ پاداش بە دەست هێنان بلەز بێ، کە دێر پێگەیشت سست و وەڕس دەبێ. **دووەم** ئەوەی کە من لە بیر کاو بەو دۆخەی کە هەیەتی قنیات کا. دیاردەکەشی ئەوەیە کە بە حاڵی خۆی دەیهێڵین و ئاوڕی لێ نادەینەو بە حەیرانی دەیهێڵینەوە». کە واتە، کە خۆشەویستی تەواو بوو، هۆگری بە هیچ شتەکی‌تر نامێنێتەوە.

لەنێو بەنی‌ئیسراییلدا پارێزکارێک بوو کە شەوانە خەریکی عیبادەت دەبوو، عیبادەتەکەی دەبردە ژێر دارێک کە مەلێکی دەنگ خۆش هێلانەی تێدا چێ کردبوو؛ وەحی هات بۆ پێغەمبەری سەردەم کە پێی بڵێ خووت بە شوێنێکەوە گرتووە، پلەیەک هاتیتە خوارەوەو بە هیچ عیبادەتێ بۆت قەرەوی نابێتەوە، مەگین ئەوەی ئەو هۆگریەشت بەو شوێنە نەمێنێ. هەندێ کەس لە خۆشەویستیدا گەیشتوونەتە ئاستێ کە لە کاتی عیبادەتدا ئاور لە لایەکی خانییەکەیان بەربووەو هیچ ئاگایان لێ نەبووە. یەکێک پای دەبوایە ببڕنەوە، لە نوێژدا بڕیانەوەو ئاگای لە خۆی نەبوو. وەحی هاتە سەر داوود کە «درۆ دەکا ئەو کەسە خۆی بە ئەڤینداری من دەنوێنێ و شەوانیش دەنوێ، مەگەر دۆست ژوانی دۆستی ناوێ؟ هەرکەس بۆم بگەڕێ، منیش لە گەڵیام». مووسا گوتی: «پەروەرندەم! لە کوێی تا بتبینمەوە؟» گوتی: «کە نیازی گەڕانت کرد، دیتمتەوە».

**دیاردەی شەشەم** ئەوەیە کە عیبادەتی لەبەر ئاسان بێ و گرانیەکەی لە کۆڵ بکەوێ. یەکێک

دەڵێ: «بیستساڵ بە گیانکەنشت خۆم بۆ نوێژی شەوراگرت، پاشان بیستساڵ بەو شەونوێژە دەژیام». کە دۆستایەتی و خۆشەویستی هێزی گرت، هیچ چێژێک ناگاتە خۆشی عیبادەتدا، چۆن دژوار دەبێ؟

**دیاردەی حەوتم** ئەوەیە کە هەموو ئەو بەندانەی گوێڕایەڵی پەروەردگار بن خۆشیانی دەوێ و میهرەبانە دەگەڵیان، هەروەها کافرو ستەمکاران بە دوژمن دەزانێ. هەروەک گوتی: أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ[1]. یەکێک لە پێغەمبەران پرسی: «خودایا! دۆستانی تۆ کێن؟» گوتی: «ئەوانەی کە چۆن کۆرپە دایکی خۆش دەوێ، منیان خۆش بوێ؛ وەکوو چۆن مەل هانا دەبەر هێلانەی دەبا، هانا بەرنە بەر یادوزیکری من؛ هەروەها وەکوو چۆن پڵینگێک تووڕە بێ لە کەس سڵ نەکاتەوە، ئەمانیش لەبەر گوناح واتووڕە دەبن».

ئەمانەی بێژران و نموونەیتر زۆرن، گەرکەسێک خۆشەویستیەکەی تەواو بێ، هەموو ئەمانەی تێدا کۆوە دەبێ؛ ئەوەش کە هەندێ لەم دیاردانەی تێدابێ، خۆشەویستیەکەی بە قەدەر ئەوەیە.

## شرۆڤەی واتای تامازرۆیی پەروەردگاری مەزن

بزانە هەرکەس حاشای لە خۆشەویستی کرد، تامازرۆییش حاشا دەکا. لە سکالاکانی پێغەمبەردایە کە گوتی: «اَسألُکَ الشوق الی لقائکَ ولذة النّظر الی وَجْهِکَ الْکَریم»[2]. هەروەها گوتی: خودای مەزن دەڵێ «قال شَوْقُ الأبْرار الی لِقائی وَاَنّی الی لِقائهِمْ لاشَدُّ شَوْقاً»، تامازرۆیی مێرخاسان بۆ من درێژەی خایاندو من پتر لەوان بۆ دیداریان تامەزرۆم.

کەواتە دەبێ واتای تامەزرۆیی بزانی، چونکە خۆشەویستی بە بێ تامازرۆیی نابێ. هەرکەس کە نەناسراوبێ، کەس بۆی تامازرۆ نابێ، ئەوەش کە ناسراوبێ، بەڵام لەبەر دەستدا بێ، ئەوەش بۆی تامەزرۆ نابن. کەواتە تامازرۆیی بۆ ئەوەیە کە لە باریکەوە هەیەو دیارەو لە باریکیکەوە نادیارو بەرپیوارە؛ وەکوو گراو کە هەردەم لە خەیاڵ و بیردار هەیەو کەچی لەبەر چاوان پیوارە. تامەزرۆیی کۆشەوە، بۆ ئەوەیە کە ئەو گراوە لە پێش چاویش حازر و ئامادە بێ. لەم رووەوە لێت روون دەبێ کە لەم دونیا گەیشتن بە پەروەرندەی مەزن بووز ناخوا؛ چونکە ئەو لە زانستدا هەیە، بەڵام لە پێش چاوان پیوارە. دیتن بە دڵ ئەوپەڕی زانینە، هەروەکوو چۆن دیتن بە چاو ئەوپەڕی خەیاڵ و داڵغەیە. ئەم تامازرۆییە تەنیا بە مردن دادەمرکێ، هەرچەن کە جۆرێک لە تامەزرۆیی پاش مردنیش

---

١- (قورئان، ٢٩/٤٨) لە بەرانبەر دین دوژمنان توندوتیژ و لە ناو خۆدا دلۆڤانن. (هـ)

٢ ـ پەروەرندەم تامازرۆی دیدار و خۆشی سەیرکردنی تۆم دەوێ.

هەردانامرکێ. چونکە کە مایەی تێگەیشتنی مرۆڤ لەم جیهانەدا لە دوو رووەوەیە: یەکەم ئـەوەی کـە ئەم زانینە، تێگەیشتن و هەست پێکردنە، وەکوو دیتن لە پشت پەردەیەکی تاریکەوە، یـان دیـتن لـە کازیوەدا، بەر لە خۆرهەلات. ئەمـە لـە دوارۆژدا روون دەبێتـەوەو ئـەم تامەزرۆییـە دادەمرکـێ. **دووەم** ئەوەیە کە کەسێک گراوێکی بێ کە ڕوومەتی دیبێ، بەلام زولف و ئەندامانیتری نـەدیبێ و بزانـێ کـە ئەوانەش هەموویان جوان و بەدەون، تامازرۆی دیداری ئەوانەبێ. هـەروەها جـوانی خـوای مـەزن بـێ ڕادەیە؛ ئەوەی کە زۆر لەم جوانیانە دەزانێ هێشتا ئەوانـەی کـە نایانزانـێ گـەلێک زۆر وزەوەنـدەترن؛ چونکە زانیارییەکانی ئەو بێ ڕادەیە و تا بەندە لە هەموو ئـەو زانیارییانـە نـەگا لـە گـەورەیی و جـوانی پەروەرندەی ناگا. ئەمەش نەلـەم دونیـاو نەلـەو دونیـا بـۆ مـرۆڤ بۆزئـاخوا، چونکـە زانـستی مـرۆڤ ڕادەیەکی هەیە. کەواتە هەرچەند لە دوارۆژدا مرۆڤ پتر شارەزای پەروەرندەی دەبـێ و زانـینی زۆرتـر دەبێ، بەلام لە سەرلەبەری ئەو زانستانەو ئەو جوانییانە ناگا.

کە چاوی دڵ لەوشتانەی بوو کە خویانن، بارودۆخی تەژی لە شـادی و خۆشـی دەبـێ بـەو دیتنـە؛ ئەوە پێی دەڵێن هۆگری. کە چاوی دڵ لەو شتانەی بوو کە لێی پیـوارن، دڵ هـەرداوای زۆرتـر دەکـا؛ ئەمە پێی دەڵێن تامازرۆیی. ئەم هۆگری و تامەزرۆییە نە لەم دونیـا و نـە لـەو دونیـا دوایـی بـۆ نییـەو هەموو دەم لە پەسلاندا دەڵین رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا[1]؛ هـەرچی لـە جـوانی پـەروەردگار لێیـان ئاشـکرا دەبێ، هەمووی ڕووناکییە، کەچی ئەمان داوای سەر لە بـەری جوانییـەکانی لـێ دەکـەن، بـەلام ئـەو دیدارەیان پێ ناکرێ. چونکە کەس بێجگە لە خوا، بە تەواوی خوا ناناسێ؛ چونکـە کـەس بـە تـەواوی نایناسێ، کەسیش بە تەواوی نایبینێ؛ بەلام ڕێگا بۆ تامازرۆکان ئاوەلایە تا بـەردەوام ئـەو دیـدارە نـوێ کەنەوەو بڕۆنە پێشەوە؛ ڕاستەقینەی چێژی لـە ڕادەبـەدەر کـە لـە بەهەشـتدایە، هـەر ئەمەیـە. گـەر وانەبایە بێ گومان خۆشی ئەو ناسینە دوایی دەهات، چونکـە هـەرچی بـەردەوام وەک خـۆی مایـەوەو نوێ نەبۆوە، دڵ خووی پێ دەگرێ و لە خۆشیەکەی بێ ئاگادەبێ، مەگین ئەوەی شـتێکی نـوێی پـێ بگا. کەواتە نیعمەتی خەلکی بەهەشت هەردەم نـوێ دەبێتـەوە هـەروەکوو چـۆن لـە کـاتی ئێـستادا ڕابردوو بەکەم و کورت دەبینێ، چونکە هەر ڕۆژ کە ڕادەبـووری لـەسـەر ڕۆژەکـان زێـدە دەبـێ. لـەم بنەماوە واتای هۆگریت ناسی؛ هۆگری زێدەبوونی حالی دلە لەگەل ئەو شتەی پێشتر هەبووە، تـا ئـاوڕ لەوەی کە ماوەتەوە نەداتەوە؛ کە سەرنجیدا ئەوە دۆخی تامازرۆیی بۆ دێتـە دی. کەواتـە ئەوینـدارانی پەروەردگاری مەزن، لەم جیهان و لـەو جیهانـدا لـە نێـوان هـۆگری و تامازرۆییـدا هـاتوچۆیانـە. لـە ئەخباری داوودا هەیە کە خودای مەزن گوتی: «ئەی داوود! خەلکی زەویـن ئاگەدارکـەوە کـە خۆشـم

---

[1] ـ (قورئان، ٨/٦٦) ئەی پەروەرندەمان! تیشەکەمان بۆ زیاتر کە. (هـ)

دەوێ هەرکەس کە خۆشی بوێم، هاونشینی ئەو کەسەم کە لە تەنیاییدا لە گەڵم دادەنیشێ، هۆگری ئەو کەسەم کە هۆگری یادی منە، هەڤاڵی ئەو کەسەم کە هەڤاڵی منە، هەڵبژێری ئەو کەسەم کە هەڵیبژاردم، فەرمانبەرداری ئەو کەسەم کە فەرمانبەرداری منە ؛ هیچ بەندەیەک نییە کە خۆشی بوێم و من لە دڵی ئاگەدار نەبم و بە خۆشەویستی خۆمی دانەنێم و لە کەسانیتری سەرنەخەم؛ هەرکەس بۆم بگەڕێ، بە ڕاستی کە دەمدۆزێتەوە؛ ئەی خەڵکی زەوی! پێ مەنێنە نێو ئەو ڕێگایانەی کە بە هەڵەدا ڕۆیشتوون؛ ڕوو لە یادو ویرو هۆگری من نێن تا منیش ببمە هۆگرتان؛ چونکە من سروشتی خۆشەویستانم لە سروشتی ئیبراهیمی دۆستم و مووسای هاوڕازم و محەممەدی هەڵبژاردەم ئافراند؛ من دڵی تامەزرۆوانی خۆمم لە ڕووناکی خۆم ئافراندو بە گەورەیی خۆمم پەروەردە کرد». وەحی هاتە سەر هەندێ لە پێغەمبەران کە «بەنده‌گەلێکم هەیە کە خۆشیان دەوێم و خوشیانم دەوێ، ئەوان تامەزرۆی منن و منیش تامەزرۆی ئەوانم، یادم دەکەن و یادیان دەکەم، سەریرم دەکرن و سەیریان دەکەم؛ گەرتۆش لەسەر ڕێچکەی ئەمان بێ خۆشم دەوێی، گەر لەسەر ڕێبازیان کلابی، بە دوژمنی خۆمت دەزانم» ئەمەی بێژاراو زۆر خەبەریتری لەم چەشنە، لەسەر خۆشەویستی و هۆگری و تامەزرۆیی هەیە، بەڵام بۆ ئەم کتێبە هەر ئەمە بەسە.

## شروڤەی راستەقینەی رەزاو هێژاییەکانی

بزانە، ڕەزابوون بە ویستی خودا بەرزترین ئاستە و هیچ پلەیەک سەرتر لەوە نییە؛ چۆنکە خۆشەویستی چاکترین پلەیەو ڕازیبوون بە هەرشتێ خودا دەیکا، بەرهەمی خۆشەویستیە؛ نە هەرخۆشەویستیەک، بەڵکوو خۆشەویستیەک کە تەواو بێ. بەم بۆنەوە پێغەمبەر فەرمووی: «اَلرِّضاء بِالْقَضاء بابُ الله الاعْظَمُ»؛ واتە: سەرترین دەرگای پەروەردگار ڕازیبوونە بەویستی ئەو. کاتێ لە هۆزێکی پرسی: «نیشانەی باوەڕتان چییە؟» گوتیان: «لە کاتی بەلادا پشوودرێژین و ڕازین بەو شتەی خوا دەیەوێ». فەرمووی: «هۆزان و زانان، لەبەر گەورەیی و بەرزی زانستیان وەختە ببنە پێغەمبەر». هەروەها فەرمووی: «ڕۆژی پەسلان هەندێ لە ئوممەتی من پەروباڵ دەردێنن و بەرەو بەهەشت دەفڕن. فریشتەکان لێیان دەپرسن کە بە کاروبارتان ڕاگەیشتن، لە سەرپردی سیرات ڕابوردن؟ دەڵێن: هیچ یەک لەمانەمان نەدی. دەڵێن: ئێوە کێن؟ دەڵێن: ئوممەتی محەممەدین. دەپرسن: بە چ کارێک ئەم ڕێز و حورمەتەتان بە دەس هێنا؟ دەڵێن: ئێمە دوو دانستەمان هەبوو: **یەکەم** لە تەنیاییشدا شەرممان دەکرد لە پەروەردگار کە گوناح بکەین؛ **دووەم** بەو نەختە بژیوەی کە خودا دەیکردە بەشمان ڕازی بووین. فریشتەکان دەڵێن: کەواتە ئەم پلەو پاگە مافی خۆتانە». هۆزەکەی مووسا لێیان پرسی: «بپرسە لە خودا کە ڕەزای لە چییە تا ئەوە بکەین». وەحی هات کە

«لە من ڕەزا بن تالێتان ڕەزابم». وەحی هاتە سەر داوود کە: «دۆستانی من چ کارێکیان بەسەر خەمی دونیاوە هەیە، چونکە ئەو خەمە شیرینی دوعاو سکالایان لە دڵ دەڕەوێنێ؛ ئەی داوود! من پێم خۆشە کە دۆستانم ڕۆحانی بن: خەمی هیچ شتێ نەخۆن و دڵ بە هیچ شتێکی دونیا نەبەستن». پێغەمبەر فەرمووی، پەروەردگار دەڵێ: «من ئەو خودایەم کە بێجگە من خوایەکی‌تر نییە، هەرکەس لەهەمبەر بەلاکانی من پشوودرێژ نەبێ و شوکرانەبژێری نیعمەتی من نەکاو بەویستی من ڕەزا نەدا، پێی بڵێ هەرۆ خودایەکی‌تر بۆ خۆت ببینەوە». هەروەها گوتی پەروەردگار دەڵێ: «چارەی خەڵکم نووسی و راوێژم بۆ کردن و کاری خۆمم توند کردەوەو بە هەرچی بمهەوێ فەرمانم دا، هەرکەس پێی خۆشە، لێی خۆش دەبم، هەرکی پێی ناخۆشە منیش لێی توورەم تا ئەو دەمەی کە دەمبینێتەوە». هەروەها گوتی خودای مەزن دەڵێ: «چاکە و خراپەم ئافراند، خۆزگە بەو کەسەی کە بۆ چاکە کردن ئافراندم و چاکە بە دەستی ئاسان دەهات، هاوار لەو کەسەی کە بۆ خراپەم ئافراندو خراپە لە دەستیدا ئاسان بوو. هاوار لەو کەسەش کە دەڵێ چۆن و بۆچی!»

یەکێک لە پێغەمبەران ماوەی بیستساڵ تووشیاری برسیەتی و ڕەش و ڕووتی و ڕەجاڵی بوو، دەپاڕایەوەو هیچ وەرامی پێ نەدەدرایەوە. بۆیە وەحی هات کە: «بەرلە ئافراندنی زەوی و ئاسمانەکان بەشی تۆ لە رزق و رۆزی هەر ئەمە بوو. دەتەوێ بە بۆنەی تۆوە کاری زەوی و ئاسمانەکان و بەڕێوەبردنیان تێک بدەم و بەو جۆرە بێ کە تۆ پێت‌خۆشە، نەک ئەو جۆرەی کە خۆم دەمەوێ؟ سوێند بە گەورەیی و شان‌وشکۆم گەر جارێکی‌کە ئەم خەیاڵەت بە دڵدابێ، ناوت لە دیوانی پێغەمبەران دەسڕمەوە». ئەنەس دەڵێ: «بیستساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کرد، هەرچیم دەکرد، نەیدەگوت بۆ وات کرد، هەر چیشم نەدەکرد نەیدەگوت بۆت نەکرد؛ بەلام گەر کەسێک دوژمنی دەگەڵم دەکرد، دەیگوت گەر لە چارەشدا نووسرابێ دەبێ هەر بێ». وەحی هات بۆ داوود کە: «ئەی داوود! تۆ ویستت هەیەو منیش هەمە، هیچ ویستێ پێک نایە، مەگین ئەوەی کە من دەمەوێ؛ گەر لە بەرانبەر ویست و خواستم ڕەزابی، ئەوەی پێت خۆشە دەتدەمێ، بەلام ڕەزانەبی و بەرەنگاری بی، بۆ ئەو شتەی کە دەتەوێ تووشی ئازارت دەکەم. هیچ شتیش نابێ مەگین ئەوەی من بمەوێ». عومەری عەبدولعەزیز گوتی: «شادی من لەو شتەیە کە ئەو لە چارەمدا نووسیبێتی، تا چ شتێکی بۆم موقەددەر کردبێ». گوتییان: «چیت دەوێ؟» گوتی: «ئەوەی ئەو بیەوێ». ئیبنی مەسعوود دەڵێ: «پێم خۆشە ئاور بەربێتە گیانم تا ئەوەی کە شتێک کە نەبووبێ بڵێم بریا بوو با و شتێک کە بووبێ بڵێم خۆزگە نەبووبا». یەک لە پارێزکارانی بەنی ئیسراییل ماوەیەکی دوورودرێژ لە عیبادەتدا کۆشەوەی زۆری دەکرد. لە خەودا پێیان گوت: «هەڤاڵت لە بەهەشتدا فلان ژنە». کە لە خەو ڕابوو بۆی گەڕا تا بیبینێتەوەو سەیری کرد بزانێ چ عیبادەتێ دەکا، دی کە بێجگە فەرزەکانی چیدی ناکا،

نە بە شەو شەونوێژ دەکا و نە بە ڕۆژ ڕۆژوو دەگرێ؛ گوتی: «پێم بڵێ کردەوەت چییە؟» گوتی: «ئەوەی کە بینیت». زۆری پێداگری کرد کە ڕاستم پێ بڵێ. ژنەکە گوتی: «دانستەیەکی بچووکم هەیە ئەوەش ئەوەیە کە کاتێ نەخۆش بم حەز بە تەندروستی ناکەم، گەر لەبەر هەتاودا بم حەز بە سێبەر ناکەم، گەر لە سێبەردا بم حەز بە بەرهەتاو ناکەم، بە هەرچی خوا فەرمووبێتی ڕەزام». پارێزکار دەستی نایەسەر سەری و گوتی: «ئەمە دانستەیەکی بچووک نییە، بەڵکوو ئێجگار گەورەو پڕنرخە».

## راستەقینەی رەزا

هەندێ کەس گوتوویانە کە بۆ کەس نالوێ کە بە بەڵاو هەرچی بە ئاوەژووی نارەزووی نەفسە، ڕەزابێ، بەڵکوو دەبێ پشوودرێژ بێ؛ ئەمەش هەڵەیە. چونکە کە خۆشەویستی زاڵ بوو، مرۆ دەتوانی بە شتێک کە دژ بە ئارەزووی نەفسی بێ رازی بێ، ئەوەش بە دوو بۆنەوە:

**یەکەم،** ئەوەندە بپەرژێتە سەر خۆشەویستەکەی و نوقمی ئەڤینی بێ کە ئاگای لە دەوروپشتی ببڕێ. هەروەک چۆن کەسی وا هەیە کە لە شەڕدا لەبەر تووڕەیی برینداریش دەبێ بەلام ئاگای لە برینەکەی نابێ تا ئەوەی کە خوێنەکەی دەبینێ؛ ئەوەش کە بە تووڕەییەوە دەڕوا و دڕکێک دەڕوا بە ژێر پایدا و بە خۆی نازانێ. کە دڵ بپەرژێتە سەر گراوەکەی، ئاگای لە برسیەتی و تینوێتی دەبڕێ. کە ئەم دۆخە بۆ ئەوین و حرسی دونیایی دەلوێ، چۆن بۆ خۆشەویستی پەروەردگاری مەزن نابێ؟ ئاشکرایە کە جوانی واتاکان لە دڵدا گەلێک زۆرتر لە جوانی ڕواڵەتی ئاشکرایە، چونکە ئەم ڕوومەتە جوانە، لە ڕاستیدا پێستێکە بەسەر زبڵدانێکدا کێشراوە؛ هەروەها چاوی دڵ کە جوانییە بەرپیوارەکانی پێ دەبینرێ، گەلێک ڕوونتر لە چاوی سەرە کە هەڵەی زۆر دەکا: بۆیە گەورە بە بچووک دەبینێ و دوور بە نزیک.

**دووەم** ئەوەیە کە ئێشی پێ دەگا، بەلام چونکە دەزانێ خۆشەویستەکەی وای پێ خۆشە، پێی ڕەزایە. هەروەک ئەوەی گەر خۆشەویستەکەی پێی بڵێ هەجامەت کە، یان دەرمانێکی تفت و تاڵ بخۆ، لەبەر ڕەزای خۆشەویستەکەی جێبەجێی دەکا. کەواتە، هەرکەس دڵنیا بێ کە ڕەزای خودا لەو شتەدایە کە ڕووی داوە، ئەمیش پێی قایل دەبێ و دەیسەلمێنێ، وەکوو بە هەژاری و نەخۆشی و بەڵاو نەداری ڕەزا دەبێ و پشوودرێژی لەسەر دەکا؛ هەروەک چۆن چاوچنۆکی دونیاویس بۆ بە دەست هێنانی قازانج ڕەنج و ئازاری سەفەر لە دەریاکاندا بە گیان دەکرێ. زۆر لە ئەوینداران گەیشتوونەتەئەم ئاستە.

ژنی فەتحی مووسلی کەوت، نینۆکی پای شکا، پێکەنی. گوتییان: «ئێشت پێ نەگەیشت؟»

گوتی: «شادی پاداش، ژانەکەی لە بیر بردمەوە». سەهلی توستەری نەخۆش بوو، دەرمانی نەدەخوارد. گوتیان: «بۆ دەرمان ناخۆی؟» گوتی: «گیانەکەم! نازانی برینی دۆست ژانی نییە؟» جونەیدەدڵێ: «لە «سری‌سقطی»م پرسی کە ئەویندار ئێشی بەلا هەست دەکا؟ گوتی: نە. گوتم: گەر برینی شیر بێ؟ گوتی: «نە، گەر حەفتا زەربەش بێ». یەکێک دەڵێ: «هەرچی خوشەویستەکەم پێی خۆش بێ منیش پێم خۆشە، تەنانەت گەر پێی خۆش بێ لە دۆزەهدا بژیم». دۆستی بێشری حافی دەڵێ: «کابرایەک لە بەغدا هەزار داریان لێ دا، هیچ دەنگی نەکرد. گوتم بۆ چیت هاوار نەکرد؟ گوتی: چونکە خۆشەویستەکەم سەیری دەکردم. گوتم: گەر خۆشەویستی گەورەت بدیایە چت دەکرد؟ هاوارێکی کردو گیانی‌دا». بێشری حافیش دەڵێ: «لە سەرەتای ئەوینداریمدا بووم. بۆ ئابادان دەڕۆیشتم. زەلامێکی گول و شێتم بینی کەوتبوو، مێرووله بەر ببوونە جەستەی و دەیانخوارد. سەریم بەرز کردەوە، بەزەییم پێیدا هاتەوە؛ کاتێ هۆشی هاتەوەبەر گوتی: ئەوە کام فزوول بوو خۆی هاویشتە نێوان من و خوداوە؟» لە قورئانیش بە ڕاشکاوی باس کراوە کە ئەو ژنانە لە جوانی یووسفدا ڕامابوون، دەستی خۆیان دەبڕی و هیچ ئاگایان لە خۆیان نەبوو. لە میسردا سیاساڵێکی بە سام بوو، خەڵکی برسی دەهاتنە دیداری یووسف و برسیەتیان لە بیر دەچووەوە. ئەمانە هەمووی ئاسەواری جوانی ئافرێندراوبوون، جا گەر کەسێک لەبەر جوانی ئافرێنەر ئاگای لە بەلا و مێمل نەمێنێ، سەیرە؟

لە سارادا کابرایەک بوو هەرچی خودا دەیفەرموو دەیگوت خێر لەوەدایە؛ کابرا سەگێکی بوو کە پاسەوانی بنەو باریان بوو، ولاخێکیان بوو کە باری بۆ هەڵدەگرتن و کەلەشێرێک کە خەبەری دەکردنەوە. جارێک گورگ هات و کەرەکەی دڕی. گوتی خێری تێدایە جارێکی‌تر سەگەکە کەلەشێرەکەی خوارد و گوتی خێری تێدایە. سەگەکەش بەلایەکی بۆ گەیشت و مردارەوە بوو. گوتی خێری تێدایە. خێزانەکەی تووڕە بوون و گوتیان: «هەرچی دەبێ دەڵێی خێری تێدایە، ئەمە چ خێرێکە کە هەرچیمان بوو فەوتا». گوتی: «ڕەنگە ئەمەش خێری تێدابێ». بەیانی کە لە خەو هەستان، هەموو ئەو خەڵکەی لە دەوروبەریاندا بوون. جەردە تالانی کردبوون و هەموویانی کوشتبوون بێجگە ئەمان کەسەگ و کەلەشێرو کەرەکەیان نەبوو و ورتەیان لێ دەرنەهاتبوو. بۆیە پێیان نەزانیبوون و تەنیا ئەمان لەو بەلایە دەرباز ببوون. کابرا بە خێزانەکەی گوت نەمگوت خێری تێدایەو کەس چاتر لە خوا نازانێ. عیسا لە شوێنێکدا ڕادەبورد، کابرایەکی بینی کە کوێرو بریندارو نەخۆش کەوتبوو، دەیگوت: سپاس بۆ ئەو خودای کە لە بەلا و مێملی پاراستم، ئەو بەلایە کە زۆربەی خەڵک تووشی هاتوون. عیسا گوتی: «چ بەلایەک ماوە کە بەسەرتدا نەهاتبێ؟» گوتی: «من تەندروستتر لەو کەسەم کە لە دڵیدا ئەو ناسینەی کە لە دڵی مندا

داینــاوە، داینەناوە». گوتی: «راست دەکەی». پاشان عیسا دەستی بەسەر و روویدا مالـی و کـابرا چاوی کردەوەو چاک بووەوەو هەستایە سەر پێ و ماوەیەک لەگەڵ عیسا ئاخـاوت و عیبـادەتی زۆری دەگەڵی کرد. شبلییان لە نەخۆشخانەدا راگرتبوو، دەیانگوت شـێتە. تاقمـێ رۆشـتنە لای، گوتی: «ئێوە کێن؟» گوتیان: «ئێمە هۆگرانی تۆین». بەردی بـۆ هاویـشتن، هـەموویان هـەڵاتن، گوتی: «درۆ دەکەن، گەر منتان خۆش بویستایە، لەبەر ئازاری من خۆتان رادەگرت».

### سەرنج

هەندێ گوتوویانە کە مـەرجی رەزامەنـدی ئەوەیـە کـە دوعـا نەکـەی و هـەرچیت نییـە لـە خـودا داوانەکەی و هەرچی پێت داوە پێی رەزا بی و لە گوناح و خراپکاری خۆت نـەبوێری، چونکـە ئـەوەش ویستی خودایەو لە شارێک کە گوناحی تێدا بـاوە یـان وەبـاو چـاو قوولـکە تێیـدا تەشـەنەی کـردووە هەڵنەیت، چونکە ئەمەش هەڵاتنە لە ویستی خودا؛ هەموو ئەمانەش هەڵەن.

پێغەمبەر لەمەڕ دۆعا گوتوویە: «اَلدُّعاءُ مُخُ الْعِبادَةِ»؛ دوعا کاکڵەی عیبادەتە. بە راستی کـە دوعـا هـەر ئەوەیە کە لە دڵدا ناسکی و شکاوی و گریان و بێورەیی و ملکەچی و هیواداری پێک بێنـێ و هـەموو ئەمانەش خوو و خدەی چـاک و پەسـند کـراون. هـەروەکوو خـواردنی ئـاو بـۆ نەهێـشتنی تینـوێتی، خواردنی نان بۆ لابردنی برسیەتی. جلوبەرگ کردنەبەر بۆ بـەرەنگاری سەرماوسۆڵـە رەوایـە و گونـاح نییە، دوعاو گازندەش بۆ لابردنی بەڵا رەوایەو هیچ گوناح نییە. هەرچی خودا فەرمانی لـەسـەر دابـێ، دژایەتیکردنی گوناحە. بەڵام رازیبـوون بـە گونـاح چـۆن دەبـێ؟ لـەوە بـەرگری کـراوەو گوتوویانـە هەرکەس پێی رەزابێ لەو گوناحەدا ئامبازە، هەروەها گوتوویە گەر لە رۆژهـەڵات بەندەیـەک بکـوژن و بەندەیەکیتر لە رۆژاوا پێـی رەزابـێ، لـەو کوشـتنەدا ئامبـازە. کەواتـە هەرچـەن گونـاحیش ویـستی خودایە، بەڵام دوو رەهەندی هەیە: رەهەندێکی دەگەڵ بەندەیە، چونکە بەویستی خۆی بـووە و خـۆی کردۆتە دوژمنی خودا؛ روویەکیتری لەگەڵ خودایە، بەوەی کـە ویـستی و نووسـراوی خۆیـە. کەواتـە بەمەی کە ویستوویە دونیا لە کوفرو گوناح خاڵی نەبێ، دەبێ رەزابین، بەڵام لـەم رووەوە کـە ئـیرادەو ویستی بەندەیەو هۆی دوژمنی خودایە، نابێ رەزابێ؛ ئەمەش کە گوتمان ناتەبا[1] نییـە. گـەر کەسـێک دوژمنێکی بمرێ کە دوژمنی دوژمنەکەشی بێ. هەم شاد دەبێ و هەم خـەمین؛ بـەڵام لـە بارێکـەوە شاد دەبێ و لە بارێکی کەوە خەمین؛ بەڵام ناتەبا ئەوەیە کـە هـەردوویان لـە یـەک رەهەنـدەوە بـن. هەروەها هەڵاتن لە شوێنی کە گوناحی تێدایە زاڵە، زۆر گرینگـە؛ هـەروەک گـوتی: أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ

---

١ ـ ناتەبا: متناقض.

ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا »[1] پێشوونان هەمیشە لەم شارانە هەڵاتوون تا تووشیاری گوناح یان ئاسەواری گوناح نەبن؛ هەروەک گوتی: وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً[2]. گەر کەسێک لە شوێنێکدا بێ کە چاوی بە نامەحرەمێک دەکەوێ، هەڵاتن لەوێ دژایەتی لەگەڵ رەزا نییە. هەروەها گەر لە شارێکدا قات و قڕی داهاتبێ، هەڵاتن لەوێش رەواو بەجێیە؛ مەگین چاو قووڵکە بێ کە بەرگری لە هەڵاتنی کراوە؛ چونکە گەر تەندروستان لەوێ بڕۆن، نەخۆشەکان دەمرن. بەڵام بۆ بەڵاکانیتر وانییە، بەڵکوو دەبێ بەو جۆرەی کە فەرمان دراوە و هۆکارەکانی پێک هێناوە ببزوونەوە و پاش بەجێهێنانی فەرمان، دەبێ لەوە رەزابین و دڵنیابین کە خێر لەوەدایە.

---

١ ـ (قورئان، ٧٥/٤) لەم شارە وا خەڵکەکەی ناهەقیکارن رزگارمان کە. (هـ)

٢ ـ (قورئان، ٢٥/٨) لەو بەڵایەش خۆپارێزن کە تایبەتی ناحەقیکارانتان نییە. (هـ)

## بنەمای دەیەم — بیر لە مردن کردنەوە

بزانە، هەرکەس تێگەیشت کە ئەنجامی لە هەر دۆخێکدا کە بێ مردنەو مەکۆی قـەبرەو ڕێنوماکـانی مونکیرونەکیرن و ژوانگەی پەسلانەو شوێنی نیشتەجێبوونی یان بەهەشتە و یان دۆزە- پەنا بـە خـودا - هیچ بیرێک پتر لە مردن بۆی گرینگ نیەو گەر ژیر بێ هـیچ راوێژێـک پتـر لـە راوێـژی مـردن بـە سەریدا زاڵ نابێ. هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «اَلْكَيِّسُ مَنْ دانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِما بَعْدَ الْمَوْتِ»[1]. هەرکـەس زۆر یادی مردن کا، ناچار دەپەرژێتە سەر تەیارکردنی توێشووی دوارۆژ و قەبر بە باخێـک دەبینـێ لـە باخەکانی بەهەشت؛ ئەوەش کە مردن لە بیر کا، بیری تەیارکردنی توێـشووی لـێ دەبـڕێ و قـەبر بـە ئەشکەوتێ لە ئەشکەفتەکانی دۆزەهـدەبینێ. لەم سـۆنگەیە کـە یـادی مـردن‌کـردن چاکەیـەکی زۆر بەرزە. پێغەمبەر فەرمووی: «اَكْبِرُوا مِنْ ذكْرِ هادِمِ اللذاتِ»؛ ئەی ئەوانـەی پەرژاونەتـە سـەر خۆشـییەکانی دونیا، یادی ئەو شتەی کەن کە هەموو خۆشییەکانتان لێ تاڵ دەکا. هـەروەها گـوتی: «گـەرچوار پـێ ئەوەی ئەنگۆ لە مردنی دەزانن بیانزانیبا، کەستان گۆشتی قەڵەوی نەدەخوارد». عایشە گـوتی: «ئـەی پێغەمبەر! کەس لە ئاستی شەهیدان هەیە؟» گوتی: «هەیە، ئـەوەی رۆژی بیـستجـار یـادی مـردن کا».

پەیغەمبەر لە لای تاقمێ رادەبورد، دەنگی پێکەنینیان بەرز بۆوە، گوتی: «ئەم کۆڕەتان لەگـەڵ ئـەو شتەی هەموو خۆشییەکتان لێ تاڵ دەکا ئاوێتـە کـەن» گوتیـان: «ئـەوە چییـە؟» گـوتی: «مـردن». ئەنەس دەڵێ پێغەمبەر فەرمووی: «زۆر یادی مردن کە، کە لـە دونیـادا پـارێز کـارت دەکـاو دەبێتـە کەفارەی گوناحانت لە دوارۆژدا». هەروەها گوتی: «كَفى بِالْمُوْتِ واعِظاً»؛ مردن بـۆ ئامۆژگـاری خەڵـکی بەستە. یارانی پێغەمبەر پەسنی کەسێکیان دەکرد، پێغەمبەر گوتی: «باسـی مـردن لـە لای چۆنـە؟» گوتیان: «باسی مردنمان لە لای نەبیستووە». گوتی: «کەواتە بـەو جـۆرە نییـە کـە ئێـوە دەیـزانن». ئیبنی عومەر دەڵێ: «من و دەکەسیتر رۆیشتینە لای پێغەمبەر، یەکێک لە ئەنسار گـوتی: "ژیرتـرین و دلاواترینی خەڵکی کێیە؟" فەرمووی: «ئەوەی پتر یادی مردن کاو بۆ تەیارکـردنی توێـشووی دوارۆژ

---

١ ـ زیرەک ئەو کەسەیە کە نەفسی خۆی کەوی کردو بۆ پاشەڕۆژی کاری کرد.

خێراتر بێ، ئەمانە ژیروزانان کە گەورەیی دونیا و دوارۆژیان برد».
ئێبراهیمی تەیمی دەڵێ: «دوو شت هەیە کە ئاسوودەگی دونیام لێ تێک دەدا: یادی مردن و ترس لە راوەستان لە بەرانبەر خودا». عومەری عەبدولعەیز هەمووشەوێ زانایانی لە دەوری خۆ کۆوە دەکرد و باسی مردنیان دەکرد، هەموویان ئەوەندە دەگریان وەک بڵێی لەسەر جەنازەی مردوو دەگرین. حەسەنی بەسری کاتێ دادەنیشت بۆ ئاخافتن، تەنیا لە مەڕ مردن و دۆژەو دوارۆژ قسەی دەکرد. ژنێ لە لای عایشە لە دڵڕەقی خۆی گلەیی دەکرد. گوتی: «زۆر یادی مردن کە تا دڵت نەرم بێ». وای کرد دڵ رەقیەکەی نەما، هاتەوەو سپاسی کرد. رەبیعی خەیسەم لە خانووەکەی خۆیدا گۆڕێکی هەڵکەندبوو، هەموو رۆژێ چەن جار دەرۆشیتە ناوی و رادەکشاو یادی مردنی لە دڵی خۆیدا نوێ دەکردەوە و دەیگوت: «گەر یەک سەعات مردن لە بیر کەم دڵم رەش دەبێتەوە». عومەری عەبدولعەزیز بە یەکێکی گوت:«زۆر بیری مردن کە؛ گەر لە ناخۆشیدا بی، هێورت دەکاتەوە گەریش لە خۆشیدا بێ، لێتی تێک دەدا».

### سەرنج

بزانە، یادی مردن‌کردن بەسێ جۆرە:

**یەکەم** یادکردنی مرۆ خافڵ و بێ ئاگایە، ئەم کەسە سەری بە دونیاوە قاڵەو کە بیر لە مردن دەکاتەوە بە کرێتی دەزانێ، چونکە لە شاوەتەکانی دوور دەکاتەوە؛ کەواتە لۆمەی مردن دەکاو دەڵێ کارەساتێکی نالەبارمان لە پێشەو مخابن کە دونیای بەم خۆشییە بە جێ دێڵین. ئەم جۆرە یادکردنە لە خودای پتر دوور دەخاتەوە. بەڵام گەر بە هەر جۆر دونیا لە چاوی بکەوێ و دڵی لێ هەڵکەنێ، ئەم یادکردنەش بێ کەڵک نییە.

**دووەم** بیرکردنی پاشگەز بوو لە گوناحە، بۆ ئەوەی بیری لێ دەکاتەوە تا ترس لە دوارۆژی بەسەر دڵدا زاڵ بێ و لە تەوبەدا پتەوتر بێ و بۆ دابین‌کردنی توێشووی دوارۆژ بلەزتر بێ و ئەمەش پاداشتێکی مەزنی هەیە. تەوبەکار مردن بە سهێت نازانی، بەڵام زوومردن بە کرێت دەزانێ، چونکە دەترسێ نەتوانێ هەڵەکانی قەرەبوو کاتەوەو ئەمەش بەم جۆرە خراپ نییە.

**سێیەم** بیرکردنەوەی خواناسە، چونکە وادەی ژوان پاش مردنەو ژوانگەی یار لە بیرناکرێ و ئەویندار هەردەم چاوی لێیە، تەنانەت بۆی بە پەرۆشە، هەروەک حوزەیفە لە سەرە مەرگدا گوتی: «حَبِیب جاءَ عَلی فاقَة»: یار لە کاتی دەسکورتیدا هات. هەروەها گوتی: «خوایا! گەر دەزانی کە هەژاریم لە دەوڵەمەندی پێ خۆشترە، نەخۆشی لە تەندروستی و مردن لە ژیان پێم جوانترە، مردنم بۆ سانا کە تا بە دیدارت بحەسێمەوە».

سەرتر لەمانەش ئاستێکی گەورەتر لەمەیە، کە مـردن نـە بـە دزێـو دەزانـێ و نـە چاوەڕوانییـە، نـە دەیەوێ زوو بگات، نە درەنگ، بەڵکوو ئەوەی پێ خۆشە کە خودا فەرموویەو ویستی خۆی لە بەرانبـەر ویستی خوادا بەخت کردووەو گەیشتۆتە ئاستی تەسـلیم و رەزا. لەزۆربـەی کاتەکانـدا بـیر لـە مـردن ناکاتەوە، مردن و ژیان لە لای وی وەکوو یەکن، چونکە بەردەوام نوقمی بیرو یادی خودایە.

## چۆنییەتی کاریگەربوونی بیری مردن لە دڵدا

بزانە، مردن کارێکی گەورەو مەترسییەکی مەزنەو خەڵک و خـوا لێـی بـێ ئاگـان و گـەریش یـادی کەن، زۆر بەسەر دڵیاندا کاریگەر نابێ، چونکە ئەوەندە دڵیان پەرژاوەتە سەر دونیا کە جێگای هیچـی-تری تێدا نەماوەتەوەو لەم رووەوە یادی خوداش چێژی زۆریـان پـێ ناگـەینێ. دەرمـانی ئەوەیـە کـە ماوەیەک لە رۆژدا دڵ لە هەرچی گیرو گرفتە دەرباز کاو تەنیا بیر لە مـردن کاتـەوە، وەکـوو کەسـێک کە دەیەوێ لە چۆڵێکدا تێپەڕێ، سەرلەبەری کارەکانی واز لێ دێنێ و تەنیا بیر لە چەندو چوونی ئـەو بگارە دەکاتەوە؛ دەبێ بە خۆی بڵێ رەنگە ئەمڕۆ رۆژی مردنت بـێ، دەسـا وەخـۆ کـەوە بزانـە چیـت پێکەوە ناوە. گەر پێت بڵێن لە دالانێکی تاریکەوە تێپەڕە، تۆش نەزانی کە ئەم رێگا هەڵـدێری هەیـە، چاڵ و چۆلی بێ یا خۆ بی گرێ و گۆڵە، زۆر دەترسـی و زراوت دەتۆقـێ، دەی سـا خـۆ مـردن و نێـو قەبر لەوە پڕ مەترسی‌ترە، چۆن دەوێری ئەوەندە خافڵ بی؟

چاترین دەرمان ئەوەیە کە لە خزم و کەس و کاریـدا رامێنـێ کـە هەریەکـەیان لـە دونیـا لـەسـەر کاروباری خۆیان بوون، بـەڵام لـە پـڕ پێمێـرد هـات و فڕانـدنی و لـە نێـو قـەبرێکی تـەنگ و تاریکـدا پەستاوتی و هەنووکە ئەو لەش و جەستە جوانەیان کرم و مار و مۆر تێی ئالاون و هیچیان لـێ نـەماوە. کە لە دونیابوون شادو بەختەوەر بوون و هیچ بیریان لـە مـردن نـەدەکردەوە. ئـەمان کۆچیـان کـردو میراتبەران، ماڵوسامانەکەیان دابەش کردو ژنیان مێردی بـە پیـاوێکی‌تـر کـردو لەگـەڵ کەسـێکی‌تـر رایدەبوێرێ و هەمووکەس لە بیری کردوون. لە یەک بە یەکی خزمانی رامێنـێ کـە چـۆن ماوەیـەکی دوورودرێژ خەریکی رابواردن و کۆوەکـردنی مـاڵوسـامان بـوون و رەنـج و مەینـەتی زۆریـان کێـشاو ئاگایان لە مردن نەبوو و نەیانزانی کە گازر کفنەکەیانی شۆردووەو لە دووکانی پارچە فرۆشـدا راینـاوە. پاشان بە خۆی بڵێ کە تۆش وەکوو ئەمانی، بێ ئاگایی و هیچ نەزانیت وەک ئەمانە، تۆش هـەتاوت لـە دەم کەلە و زۆری نەماوە ئاوابێ، تەنیا ئەم بەختەت هەبووە کە ئەمانە بەر لە تۆ رۆیـشتوون و بـە هـۆی ئەوانەوە پەندت پێ دراوە «فانَّ السعیدَ مَنْ وُعظ بغَیْرِه»؛ بەختـەوەر ئەو کەسەی بـە هـۆی کەسـانی‌تـرەوە پەندی پێ دەدەن. لە دەست و پێ و قامک و سەرو چاویدا رامێنی کـە زۆر نابـا کـە مـارو کـرم تێـی بەربن و هەموو ئەندامی لێک هەڵوەشێ و ببێتە خۆراکی مار و مۆر و گیای لێ بروێ. بیر لـە رووومـەتی خۆی لە نێو قەبردا کاتەوە: مردارێکی گەنیوو هەڵوەشـاو. ئەمـەو شـتی لـەم چەشـنە دەبـێ هـەر رۆژ

بەخۆی بلێ، بەڵکوو بیری مردن بەسەر دڵیدا کاریگەر بێ؛ چونکە یادکردنی ئاسایی بەسەر دڵدا کاریگەر نابێ. مرۆڤ تەرمی زۆر بەڕێ کردووەو هەموو کات خۆی بە بینەر زانیوەو چجار خۆی بە مرودویی و بە تەرمی نەبینیوە. مرۆڤ تا شتێ بە چاو نەبینی بیر لێکردنەوەی بۆی ئەستەمە. بەم بۆنەوە پێغەمبەر لە خوتبەدا فەرمووی: «دەڵێی ئەم مردنەیان بۆ ئێمە نەنووسیوە، دەڵێی ئەم مردووانە بۆ سەفەر دەڕۆن و زوو بە زوو دەگەڕێنەوە، ئەمانە دەنێنە نێو خاک و میراتیان دەخۆن و ناگایان لە خۆیان نییە». هەروەها زۆربەی هۆی یادنەکردنی مردن، درێژی ئاواتەکانەو بناغەی هەمووی خراپییەک هەر ئەمەیە.

## شرۆڤەی هێژایی ئاواتی کورت

بزانە، هەرکەس تەمەنی درێژی بوێ و پێی وابێ زۆری ماوە تا کاتی مردنی پێ بگا، هیچ کارێکی دینی لێی ناوەشێتەوە؛ چونکە بە خۆی دەڵێ جارێ ژیان زۆری پێوە ماوەو کاتت بۆ عیبادەت و تەوبە زۆرە، جارێ بۆ خۆت رایبوێرە. بەڵام گەر کەسێک مردن نزیک بزانێ، بەردەوام خەریکی دابینکردنی کاری دوارۆژ دەبێ و ئەمە بنەمای هەموو بەختەوەرییەکە. پەیغەمبەر بە ئیبنی عومەری گوت: «بەیانی کە لە خەو ڕادەبی، بە خۆت مەڵێ تاشەو زیندووم؛ شەو کە دەنووی مەڵێ بەیانی لە خەو ڕادەبم؛ لە ژین توێشووی چاکژیان کۆوە کە و لە تەندروستی توێشووی نەخۆشی وەرگرە، چونکە نازانی بەیانی لە لای خودا ناوت چییە». هەروەها گوتی: «لە هیچ شت بە قەدەر دوو دانستەتان دڵەودوانیم: یەکەم کەوتنە دووی ئارەزووەکانی نەفستان؛ دووەم هیوا بە تەمەنی دوورودرێژ».

ئوسامە شتێکی بە قەرز کڕیبوو کە تا مانگیتر پارەکەی بدا. پێغەمبەر فەرمووی: «پێتان سەیر نییە کە ئۆسامە بۆ ماوەی مانگێک شتی بە قەرز کڕیوە؟ ئۆسامە هیوای درێژە لە ژیاندا. سوێند بەو خودایە کە گیانی محەممەدی لە دەستدایە! چاو ناترووکێنم مەگین بیر کەمەوە کە بەر لە هەڵێنانی دەمرم، چاو ناکەمەوە مەگەر بیر کەمەوە بەر لە لێکنانی دەمرم، هیچ پاروویەک نانمە سەر زارم مەگین بیر کەمەوە بەر لە قووتدانی دەمرم». پاشان گوتی: «ئەی خەڵکینە! ئەگەر ژیرو تێگەیشتوون، خۆتان بە مردوو بزانن. سوێند بەو خودایە کە گیانی محەممەدی لە دەستدایە ئەوەی بەڵێنی دراوە دەگاو کەس لێی دەرباز نابێ». پێغەمبەر کە ئاو دوور بایە، تەیەمومی دەکرد، دەیانگوت ئاو نزیکە، دەیفەرموو: «ڕەنگە تا بگەم بە ئاو زیندوو نەبم». عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەڵێ: «پێغەمبەر چوار گۆشەیەکی کێشا، خەتێکی راستی لە ناوەڕاستەوە کێشاو لە دەوری ئەوەش چەن خەتی وردی کێشا. لە دەرەوەی چوار گۆشەکەش چەن خەتیتری کێشا. گوتی ئەم خەتە راستە مرۆڤە، ئەم

چوار گۆشەیەش کە دەورە لێ داوە مەرگە؛ ئەم خەتتە وردانەش کە لە دوولاوە تێی ئالاون، بەلاو زیان و مێملی رێگان. کە لە یەکیان دەپەڕێتەوە لە یەکێکتریان تووش دەبێ، تا ئەوەی کە دەگاتە کۆتایی چوار گۆشەو دەمرێ. ئەم خەتتەش کە لە دەرەوەی چوار گۆشەکەیە هیواو ئاواتەکانین، چونکە هەردەم بیر لە ئاواتگەلێ دەکاتەوە کە لە زانستی خوادا لە دەرەوەی مردنی مرۆڤن».

هەروەها پێغەمبەر فەرمووی: «مرۆڤ هەر رۆژ پیرتر دەبێ، بەلام دوو شتی تێدا گەنجتر دەبێ: ئاواتی ماڵ و ئاواتی تەمەن درێژی». لە خەبەردا هاتووە کە «عیسا لە شوێنێکد تیدەپەڕا، پیرە پیاوێکی بینی بێلی بە دەستەوە بوو و کاری دەکرد. عیسا گوتی خوایا هیوای لە دڵ بڕەوێنە. کابرا بێلی داناو نووست. پاشان عیسا گوتی خوایا ئاواتی لە دڵ بڕوێنەوە. کابرا هەستاو بێلی هەڵگرت و کاری دەس پێکردەوە. عیسا پێی گوت ئەوە چ بوو؟ پیرەپیاو گوتی: هات بە دڵمدا کە تۆ پیری و مردن نزیکە بۆچی کار دەکەی، بێلم داناو راکشام تا بمرم. لە پڕ هات بە دڵمدا کە تا مردن دەگا دەبێ هەر بژی، هەستامە سەر کارەکەم». پێغەمبەر فەرمووی: «دەتانەوێ بڕۆنە نێو بەهەشتەوە؟» گوتیان: «دەمانەوێ». گوتی: «کەواتە، ئاواتەکانتان کورت کەنەوە و بەردەوام بیرتان لە لای مردن بێ و بەو جۆرەی کە شیاوە لە خوا شەرم کەن».

### شرۆڤەی هۆکانی درێژی ئاوات

بزانە، مرۆڤ ژینێکی درێژی لە دڵی خۆیدا کێشاوە، هۆکەشی دوو شتە: یەکەم نەزانی و دووەم خۆشەویستی دونیا.

**خۆشەویستی دونیا** کە بەسەر دڵدا داسەپا، مردن ئەو خۆشەویستیەی لە مرۆ جیاوە دەکا، بۆیە بە نەیاری دەزانێ و دانی خێری پێدا نانێ. مرۆڤ هەرچی پێی خۆش نەبێ، لە خۆی دووری دەکاتەوەو خۆی دەخاپێنێ و ئەو نەخشە لە دڵی خۆیدا دەکێشێ کە خۆی حەزی لێیە. کەواتە هەمیشە ژنومنداڵ و ماڵوسامانی بە هەتاهەتا دەزانێ و مردن کە دژ بە ئاواتەکانیە، لە بیری خۆی دەباتەوە. گەر بێتەوە بیری، دەیخاتە پشت گوێ و دەڵێ ئەی پیاو! ژیان زۆری پێوە ماوە، توێشووی مردنیش دواتر تەیار دەکەین؛ کە گەورەتر بوو دەڵێ گوێی مەدەرێ تا پیر دەبی. کە پیر دەبێ دەڵێ با ئەم خانووەش بکەمەوەو ئەم کچەم بدەم بە مێردو ئەم کوڕەم بکەم بەزاواو بیرێک لەم زەوییەدا هەڵکەنم و خەمی نانم لە کۆڵ کەوێ، ئەوسا بە خاترجەمی عیبادەت دەکەم. هەروا وەدرەنگی دەخاو لە هەر کارێک دەکاریتر دەبێتەوەو ئەم نەزانە نازانێ کە دونیا تەنیا بە دوور لێگرتنی لێی دەخەلسێ و بەس. چونکە پێی وایە رۆژێ لە کاری دونیا پشوودەدا و کاری نامێنێ، رۆژ بە رۆژ دەیخاتە دواوە تا لە گزوگوممەت مردن پێی دەگاو نسک و ناهمێ و هەناسە سارد دەمێنێتەوە. بەم بۆنەوە هاواری زۆربەی خەڵکی دۆژەە، لەوەدوا خستنە. سەرچاوەی هەموو ئەمانەش خۆشەویستی دونیاو بێ ئاگایی

لەوەیە کە پێغەمبەر فەرمووی: «هەرچی دەتەوێ خۆشت بوێ، چونکە لێتی دەسێننەوە».

**نەزانی**، ئەوەیە کە بەلاوەتی متمانە دەکاو نازانێ تا پیرێ دەمرێ دەیان گەنج و لاو دەمرن و لە نێو شاردا ژمارەی پیرەکان لە گەنجەکان زۆر کەمترن. چونکە بێجگە لە هەندێکیان ئەوانیتر ناگەنە پیری. هەروەها لە کاتی تەندروستیدا مردنی لەپڕ بە دوور دەزانن و تێنەگەیشتوون کە گەر مەرگی نەکاو دوورە، خۆ نەخۆشی نەکاو دەگمەن نییە، چونکە زۆربەی نەخۆشییەکان لەپڕونەکاو تووش دەبن و کە نەخۆشی هات مردنیش دێ؛ تەنانەت دەڵێن تا و یاو پێشڕەوی مردنە و مردنی نەخۆش دەگمەن نییە.

کەواتە دەبێ بەردەوام لە لای خۆی بیر لە مردن کاتەوە، وەکوو هەتاو کە بە خێرایی پێی دەگا، نەک وەکووسێبەر کە هەرچی بڕوا پێی ناگا.

## دەرمانی ئاواتی درێژ

بزانە، دەرمان، لابردنی هۆی ئاوات درێژییە. کە هۆکانیت ناسی دەبێ بپەرژێتە سەر لابردنیان. نەهێشتی خۆشەویستی دونیامان لە کتێبی خۆشەویستی دونیادا راڤە کرد. بە کورتی هەرکەس بە باشی دونیا بناسێ توخنی ناکەوێ؛ چونکە دەزانێ کە خۆشییەکانی دونیا چەن رۆژەو بە مردن هەمووی پووچەڵ دەبێتەوەو لە هەمان کاتیشدا خۆشییەکانی دونیا لێڵ و کەڵ و کوتەرن و لە رەنج و ئازار خاڵی نین و بۆ کەس تاسەر نابن. هەرکەس بیر لە کورتی دونیاو دوورو درێژی دوارۆژ کاتەوە، دەزانێ کە فرۆتنی دوارۆژ بە دونیا وەکوو ئەوەیە کە کەسێک درهەمێکی لە خەودا خۆشتر بوێ لە دینارێک لە بێداریدا؛ چونکە دونیا وەکوو خەونێکە: «اَلنّاسُ نِیامٌ فَاِذا ماتوُا انْتَبَهُوا»[1].

بەلام دەرمانی نەزانی بە بیرێکی بێخەوش و زانستێکی راستەقینە پێویستی هەیە، دەبێ بزانێ چونکە مردن لە دەست ئەودا نییە، ئەو کاتە کە ئەو دەیەوێ نایێ، تا بە لاوتی یان کارێکی کە متمانەکا.

## ئاستەکانی ئاوات درێژی

خەلکی لەمەدا جیاوازن: کەس هەیە کە دەیەوێ هەمیشە لە دونیا بێ، هەروەک خودا گوتی: یَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ[2]؛ کەس هەیە کە دەیەوێ پیر بێ؛ کەس هەیە پتر لە یەک ساڵ هیوای نییە و راوێژی بۆ ناکا؛ کەس هەیە کە پتر لە رۆژێک هیوای نییەو راوێژی سبەی ناکا؛ هەروەک

---

١ - خەڵکی نووستوون بە مردن لە خەو رادەبن.

٢ - (قورئان، ٩٦/٢) هەرکام لەوان پێی خۆشە هەزار ساڵ بژی. (هـ)

عیسا گوتی: «خەمی نانی سبەی مەخۆن، چونکە گەر سبەی ماوەتان مابێ. بژیویـشتان هەیـەو گـەر ژینتان نەمابێ، خەمی نانی کەسانیتر مەخۆن». کەسیش هەیە هیوای بـە سـەعاتیتـر نییـە، وەکـوو پێغەمبەر لە کاتی ئاودەستدا تەیەمومی کردو گوتی نەکوا بە ئـاو نەگـەم و بمـرم؛ کەسـیش هەیـە بـە تاکە ساتێ مردن لە پێش چاوی ون نابێ، هـەروەک پێغەمبـەر لـە مـەعازی پرسـی لـە راسـتەقینەی باوەڕی، گوتی: «هیچ نەبووە هەنگاو هەلگرم و دلنیا بم کـە دایـدەنم». ئەسـوەدی حەبەشـی نـوێژی دەکرد، بە هـەردوولا دەینـواڕی. گوتیـان: «بـۆچی دەگـەڕی؟» گـوتی: «دەڕوانم بـزانم پـێمیرد لـە کوێڕادێ».

بە کورتی خەلک لەم چەمکەدا جیاوازن. هەروەها هەرکەس پتر لە مانگێک هیـوای نییـە، هێژاتـرە لەو کەسەی کە چل رۆژ هیوای هەیە و شۆپی ئەوەش لە هەلس‌وکەوتیـدا دیـارە؛ چونکـە ئـەوەی دوو برادەری بێ کە یەکیان مانگێکیتر دەگەڕێتەوەو ئەویتریان سالێکیتر، راوێـژ بـۆ هاتنـەوەی ئـەوەیان دەکا کە مانگیتر دێتەوەو دواتر راوێژی هاتنەوەی ئەویتر دەکـا. کـەس هەیـە پێـی وایـە کـە ئـاوات کورتە، بەلام نیشانەی ئەمە ئەوەیە کە یەک بە یەکی کاتەکانی بە هەل بزانێ و لە کاری چاکـەدا بلـەز بێ. هەروەک پێغەمبەر فەرمووی: «پێنج شت بەرلە هاتنی پێنج شت بـە هـەل بـزانن. لاوی بـەر لـە پیری، تەندروستی بەر لە نەخۆشی، دەولەمەندی بەر لـە هـەژاری، دەسـتپەرژان بـەر لـە سەرقالـی و ژیان بەر لـە مـردن». دیـسان فـەرمووی: «دوو نیعمـەت هەیـە کـە زۆربـەی خەلـک پێـی نـازانن: تەندروستی و دەستپەرژان». پێغەمبەر هەرگا بێ ئاگاییەکی لە یارێکی دەدی، هـاواری لـێ دەکـردن کە«مردن هات و هاوردی چ بەختەوەری، چ چارەڕەشی». حوزەیفە دەلێ: «هـیچ رۆژێـک نییـە کـە بانگبێژ هاوار نەکا کە هۆ خەلکینە! کۆچ بکەن! کۆچ بکـەن!». داوودی تاییـان دی کـە بلـەز بـۆ نـوێژ دەڕۆیشت، گوتیان: «ئەم پەلەیە بۆچییە؟» گوتی: «لەشکر لەبەر دەرگای شار چـاوەنۆڕن - مەبەسـتی مردووانی قەبرستان بوو- کە بمبەن، تا نەمبەن لەوێ هەلناسم».

ئەبووموسا ئەشعەری لە کۆتایی ژیانیدا کۆشەوەی زۆری دەکرد. گوتیان:«گەر نەختێ بەزەییت بـە خۆتدا بێتەوە چ دەبێ؟» گوتی:«ئەسپ لە کـاتی غاردانـدا هـەموو هەولـی خـۆی لـە کۆتاییـدا دەدا، ئەمەش دواین قۆناغی ژینی منە لە کۆشەوە پشوو نادەم».

## شرۆڤەی ناویلکە و ئێشی گیانکەندن

گەر مرۆڤ بێجگە لە مردن و ئێشی گیان کەنشت، هیچی لـە پـێش نەبایـە، گـەر نـەختێ ئـاوەزی هەبێ، دەبوایە لە ترسی ئەو گیانەلایە هیچ چێژی دونیای وەرنەگرتایە؛ چونکە گەر بترسـێ کـە ترکـێ بێتە نێو ژوورەکەی و بە رمب لێی بدا، لەبەر ترسی ئەو ترکە خەو نایەتە چاوی و هیچی پـێ نـاخورێ. رەنگـە ئـەو ترکـە هـەر نـەیێ، بـەلام هـاتنی پێمێـرد و کێـشانی گیـان، لادانی بـۆ نییـە. بـێشـک

گیان‌کەنشت، بە ئێشترە لە رمبی ترک؛ بەڵام لێنەترسان نیشانەی نەزانییە. ئێشی گیان‌کەندن بە چەشنێ کە هەمووان گوتوویانە، دژوارترە لەوەی کە کەسێک بە شیر کەرت‌کەرت بکەنەوە، یان لە ناوەڕاستەوە بیکەنە دووپاژەوە. چونکە ژانی برین لەبەر ئەوەیە کە ئەو شوێنە کە شیر پێی دەگا، گیان ئاگەداری دەبێتەوەو شوێنی شمشێر دەنیشێتە ژان، بەڵام ئێشی ئەم گەلێک لەوە زۆرترە، چونکە بە هەموو ئەندامی گیان رادەگا. گیان کەندن ژانێکە کە لە خودی گیاندا دێتە دی کە لە هەموو ئەنداماندا هالاوە؛ بێدەنگی ئەو کەسە لەبەر وزە لێ برانە، چونکە زمانی لەبەر دژواری ئەم کارەساتە لەنگ دەبێ و فام و هۆشی نامێنێ؛ ئەمە تەنیا کەسێک دەیزانێ کە چەشتبێتی یان بە تیشکی پێغەمبەری بەر لە چەشتن دیتبێتی. هەر وەک عیسا دەڵێ: «حەوارییەکانم! لە خوا بپاڕێنەوە کە ئێشی گیان‌کەنشتم ئاسان کاتەوە، چونکە دەترسم لەبەر ترسی گیان کەنشت بمرم». پێغەمبەر لە سەرەمەرگدا دەیگوت: «اَللّٰهُمَ هَوِّنْ عَلى مُحَمَّدٍ سَكَرَاتِ الْمَوْتِ»[1]؛ عایشە دەیگوت: هیوام نییە کە کەس گیان‌کەندنی سانابێ، لەبەر دژواری گیان کەندنی پێغەمبەر کە دیم و لەو کاتەدا دەیگوت: «پەروەرندەم! کە ئەم گیانەم لە نێو ئێسک و دەمارو پێستم دەردێنی، ئەم ئازارەم بۆ کەم کەوە». پەیغەمبەر بەم چەشنە ئەو ئێشەی راڤە دەکرد:«وەکوو سێسەد زەربەی شیرە، هەر زەربەتێک یەک گیان کەندنێ». هەروەها گوتی:«ئاسان‌ترین گیان کەنشت ئەوەیە کە گیان وەکوو دڕک لە نێو پەمووداا ئالابا، لە نێو لەشدا رۆچووبێ و بە هێوری دەرنەیێ و ناچار بی کە بە زۆر بیکێشی و هەرچی رەگ و دەمارە بیچڕێنی». پێغەمبەر لە کاتی گیانەڵای کەسێکدا رۆیشتە سەردانی و گوتی: «دەزانم لە چ رەنجێکدایە، هیچ دەمارێکی نییە کە ژانی تێ بەرنەبووبێ». عەلی دەیگوت: «خەزاکەن با لە شەڕدا بکوژرێن، چونکە هەزار زەربەی شیر لە گیان کەندن پێم ئاسانترە». عیسا و هاوڕێیانی لە گۆڕستانێکەوە رادەبوردن. بەئیزنی خودا مردوویەکیان زیندوو کردەوە و گوتی: «چیتان لێم دەوێ هۆ خەلکینە! پەنجا ساڵە مردووم و هەنووکە تاڵی گیان کەندنم لە گەڵایە».

لە ئەسەردا هاتووە کە «بڕوادارێک کە مابێتی بگاتە ئاستەبەرزەکانی بەهەشت، گیانەڵای بۆ دژوار دەکەن تا پێی بگات؛ کافرێکیش کە چاکەی کردبێ، گیانەڵای بۆ ئاسان دەکەن تا هیچ مافێکی نەمێنێ». لە خەبەرداهاتووە کە: «کاتی مووسا مرد خودا لێی پرسی خۆتت لە گیانەڵادا وەک چی دەدی؟ گوتی وەکوو مریشکی زیندوو کە سووری کەنەوە، نە بتوانێ بفڕێ و نە بمرێ تا رزگار بێ». عومەر لە کەعبولئەحباری پرسی: «گیان کەنشت چۆنە؟» گوتی: «وەکوو ئەوەیە کە لقێکی پڕ دڕک بەلەشی کەسێکدا بکەن و هەر دڕکێ لە دەمارێکدا رۆبچێ و پاشان زەلامێکی بەشان و باهۆ ئەو

---

[1] - پەروەرندەم ئاویلکە لە محەممەد ئاسان کەوە.

دڕکانە بکێشیێتە دەرەوە».

**کارەستەکانی گیانە لا**

بزانە بێجگە لەم کارەساتە، سێ کارەساتی پڕ مەزن لە پێشدایە:

**یەکەم** ئەوەی کە روومەتی پێمێرد[1] دەبینێ. لەخەبەردا هاتووە کە «ئیبراهیم بە پێمێردی گوت دەمەوێ لەو ڕواڵەتەدا کە گیانی گوناحباران دەکێشی بتبینم. گوتی: توانی دیتنت نییە. گوتی: چارنییە. خۆی لەو ڕواڵەتەدا پێی پیشان دا. زەلامێکی بینی رەش و حەیتەو مەندەبۆر بە پرچی گژو جلکی رەش، کە دووکەڵ و ئاوری لە دەموللووت دەردەهات. ئیبراهیم کەوت و بوورایەوە. کە هاتەوە سەرخۆی، پێمێرد وەک خۆی لێ هاتبووەوە گوتی: گەر گوناحکار تەنیا روومەتی تۆ ببینێ بۆی بەستە». هەرچەند چاکەکاران لەم ترسە رەستوون و بە روومەتێکی جوان و بەدەو پێمێرد دەبینن، بە چەشنێ کە گەر کەسێک بێجگە روومەتی ئەو ئاسوودەگی نەبینێ، بۆی بەستە.

سلەیمانی کوڕی داوود بە پێمێردی گوت: «بۆچی لە نێوان خەڵکدا دادوەرانە نابزوێتەوە؟ یەکێک زووبەزوو دەبەی، یەکێک ماوەیەکی دوور و درێژ دەژی؟» گوتی: «ئەمە بە ئیزنی من نییە، بۆ هەرکەسە نامیلکەیەکم پێ دەدەن، چی نووسرابێ وادەکەم».

«وهب بن منبه» دەڵێ: «ڕۆژێ پادشایەک لە خەو ڕابوو، گوتی بەرگەکانیان بۆ هێنا، ئەوەی کە جوانتر بوو دەبەری کرد. گوتی ئەسپەکانی بێنن، ئەوەیان کە خۆشبەزتر بوو سواری بوو. ئەوەندە بە فیزو دەمارەوە دەڕۆیشت کە ئاوڕی لەکەس نەدەدایەوە. لە پڕ پێمێرد لە بیمچی پیرێکی هەژاردا هاتە پێشەوە گوتی سڵاو. وەرامی نەدایەوە. هەوساری ئەسپی گرت. گوتی: «مەگەر شێتی، نازانی چ دەکەی؟» گوتی: «پادشا کارم پێتە». گوتی: «ڕاوەستە با دابەزم». گوتی: «نە، هەر ئێستا». سەری هێنایە پێشەوەو گوتی: «منم پێمێرد، هاتووم گیانت بکێشم». رەنگ لە رووی پادشا نەما، زمانی لەنگ بوو گوتی:«ماوەم بدە با بڕۆمەوە بۆ ماڵ و ماڵاوایی لە ژن‌ومنداڵم کەم». گوتی:« نە، هەر ئێستا گیانت دەکێشم». ئەمەی گوت و گیانی کێشا. لەوێ ڕۆیشت، بڕوادارێکی بینی، گوتی رازێکم هەیە. گوتی: «بیڵێ». گوتی: «منم پێمێرد». گوتی: مەرحەبا! دێرهاتی، لە مێژە چاوەڕوانتم. هێژاتر لە تۆ کەس نایێتە لام. هەرلێرە گیانم بکێشە». گوتی:« جارێ دانیشە، گەر کارێکت هەیە جێ بە جێی کە». گوتی: «من کاری لەمەگرینگترم نییە کە خودانی خۆم ببینم». گوتی: «کەوایە، بەو جۆرەی کە پێت خۆشە گیانت دەکێشم». گوتی:« دەی ڕاوەستە با دەسنوێژ بشۆم و نوێژ بخوێنم، کە کڕنۆشم برد، گیانم بکێشە». بەو چەشنە گیانی سەند.

---

[1] ـ پێمێرد: ملک الموت.

دیسان «وهب بن مُنبه» گوتی: «لە زەویدا پادشایەکی زۆر گەورە دەژیا، کەس لەو گەورەترو بەدەسەلاتتر نەبوو. پێمێرد گیانی کێشا. کە گەیشتە ئاسمان فریشتەکان گوتیان: "ئەی پێمێرد کەس بووە کە کاتی گیان کێشاندا بەزەییت پێیدا بێتەوە؟" گوتی: "ژنێکی سک پڕ لە چۆلێکدا بە تاقی تەنێ منداڵێکی بوو، کورەکەی دانا. حوکمم لێ کرا کە گیانی ئەو دایکە بکێشم، گیانی دایکم سەند و ئەو کۆرپە تەنیایەم لەو چۆڵەدا بەجێهێشت؛ زۆرم بەزەیی بەو دایکە و بەو کۆرپەیە هاتەوە. فریشتەکان گوتیان:"ئەم پادشا مەزنە کە لە زەویدا کەس نەبوو شان لە شانی بدا هەمان منداڵی ساوا بوو". گوتی:"سُبحان الطیف لما یَشاء"».

لە ئەسەردا هاتووە کە شەوی نیوەی شابان نامیلکەیەک دەدەنە دەست پێمێردەوە کە گیانی ئەو کەسانەی کە دەبێ بیکێشێ، هەمووی تێدایە: یەک خەریکی ماڵ کردنەوەیە، یەک خەریکی ژن هێنانە، یەک خەریکی دوژمنیە و ناوی لەوێدا نووسراوە.

ئەعمەش دەڵێ: «پێمێرد رۆیشتە لای سلەیمان. ناوچاوی لە یەکێک لە نەدیمەکانی گرژ کرد، کە رۆیشتە دەرەوە کابرا لە سلەیمانی پرسی ئەمە کێ بوو کە واسەیری دەکردم؟ گوتی پێمێرد بوو. نەدیم گوتی: "بە با بفەرموو تا هەڵمبگرێ و بمباتە هیند، با کاتێ گەڕایەوە نەمبینێ". سلەیمان وایکرد. کاتێ پێمێرد گەڕایەوە سلەیمان ئەم باسەی بۆ گێڕایەوە. گوتی فەرمانم پێ درابوو کە لەم کاتەدا ئەو کابرایە لە هیندە و گیانی بکێشم. کە چاوم پێ کەوت گوتم ئەمە لێرە چ دەکاو چۆن دەگاتە هیند. کە رۆیشتمە هیند، دیم لەوێ ئامادەیە». مەبەست لەم چیرۆکە ئەوەیە کە بڵێ کەس لە دیداری پێمێرد دەرچوونی بۆ نییە.

**کارەساتی دووەم** دیداری ئەو دوو فریشتە کە بەسەر هەموو کەسدا داسپێردراون: چونکە لە خەبەردا هاتووە کە پاش مردن ئەم دووانە دێنە دیداری: بەندە گەر گوێڕایەڵ و چاکەکار بووبێ، پێی دەڵێن: جَزاکَ اللهُ خَیْراً، عیبادەتی زۆرت لە لامان کرد و زۆرت ئاسوودەگی پێ گەیاندین؛ گەریش بەندە گوناحبار پێی دەڵێن: لاجزاک الله خیراً، خراپەو هەڵەی زۆرت لە لامان کرد. ئەمە لەو کاتەدایە کە بەندە گیانی دەکێشن و سەیری دەورو پشتی دەکاو چاولێک نانێ.

**کارەساتی سێیەم** ئەوەیە کە شوێنی خۆی لە گیانەلادا دەبینێ کە لە بەهەشتدا بێ یان لە دۆزەهدا؛ چونکە پێمێرد پێی دەڵێ: «دۆستی خودا مزگێنی بەهەشتت پێ دەدەم»، گەریش گوناحکار بێ دەڵێ:«دوژمنی خودا مزگێنی دۆزەهت لێ بێ». رەنجی ئەوە سەرباری رەنجی گیانکەنشت دەبێ و ئەمە ترسێکی زۆر کەمە کە لە دونیادا دەکەوێتە گیانی و ئەوەی لە قەبردا تووشی دێ زورتر لەمەیە.

## شرۆڤەی ئاخافتنی قەبر دەگەڵ مردوو

پێغەمبەر فەرمووی: «کاتێ مردوو لە گۆر دادەنێن، گۆڕ پێـی دەڵـێ: "مخـابن ئـەی کـوڕی ئـادەم بۆچی فریوی منت خوارد؟ نەتزانی من خانووی سزاو ئازارم، خانووی تەنیاییم و خـانوی کـرم و مـارم؟ بەچی فریوت خوارد کاتێ بە سەرمندا رادەبوردی و پایەکت لە پێش و پایەکت لە پـاش دادەنـاو زۆرت سەیر لێ دەهات؟" گەرمرۆڤی چاک بێ، یـەکێک بـە جێـی ئـەم دەڵـێ: "چ دەڵـێ ئـەی گـۆڕ، ئـەم چاکەکارە و لەدونیادا خەریکی فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە بـووە". گـۆڕ دەڵـێ: کەواتـە بـۆی دەبمە گۆڵستانێکی شین و کەسک، لەشی دەبێتە رووناکی و گیانی بەرەو ئاسمان دەبرێ».

لە ئەسەردا هاتووە کە کاتێ مردوویەک لە قەبر دەنێن و ئازاری دەدەن، جیرانـەکانی بانـگ دەکـەن کە «هۆ زیانکار! تۆ مایتەوەو ئێمە هاتین، بۆچی لە مردنی ئێمـە پەنـدت نـەگرت؟ نـەتزانی ئێمـە کـە سەرەتا هاتین و کارو کردەوەمان بڕایەوە کەچی تۆماوەی زۆرتـرت پـێ درا، بـۆچی ئـەوەی ئێمـە لـە دەستمان دا تۆ کەڵکت لێ وەرنەگرت؟» هەروەها لە هەموو سووچێکی زەویوە بانگ دەکەن کـە «هـۆ هەڵخەڵەتاو بە دونیا! بۆچی لەو کەسانەی کە بەر لە تۆ رۆیشتن و وەکوو تـۆ هەڵخەڵـەتابوون، پەنـدت نەگرت؟»

لە خەبەردا هاتووە کە کاتێ بەندەیـەکی شـیاو و چاکـەکار دەنێنـە نێـو گـۆڕ، کـردەوە چاکـەکانی دەورەی لـێ دەدەن و چـاودێری دەکـەن. کـە فریـشتەگەلی ئـازاردان لـە لای پایـەوە دێـن، نـوێژ بەرەنگاریان دەبێ و دەڵێ: «نە، چونکە لەبەر رەزای خودا زۆر لەسەر پێـوە راوەسـتاوە». کـە لـە لای سەریەوە دێن، رۆژوو بەر بەستیان دەبـێ و دەڵـێ: «نـە، بـە برسـیەتی کۆشـەوەی زۆری لـە دونیـادا کردووە». کە لە لای لەشیەوە دێن، حەج و خەزا پێشیان پێ دەگرن و دەڵێن: «نـە، رەنجـی زۆریـان بە لەش کێشاوە». کە لە لای دەستیەوە دێن، سەدەقە بـەرەنگاریان دەبـێ و دەڵـێ: «نـە، وازی لـێ بێـنن چونکـە بـەم دەسـتانە سـەدەقەی زۆری داوە». فریـشتەکان دەڵـێن: «بـە پـیرۆزت بـێ». فریشتەگەلی رەحمەت دێن و رایەخێکی بەهەشتی لە گۆڕەکەیدا رادەخەن و قەبرەکەی تاچاوبـڕدەکا بۆی ئاوەڵا دەکەن و قەندیلێک لە تیشکی بەهەشتی بۆ دێنن با گۆڕەکـەی تـا رۆژی پەسـڵان روون و پڕ تیشک بێ. عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلا دەڵێ پەیغەمبەر فەرمووی: «کاتێ مردوو لە گـۆڕ دەنـێن دەنگی پای خەڵکی دەبیسێ کە دوابەدوای دێن، بەڵام کەس بێجگە کە گۆڕ دەگەڵی قسە ناکات کـە پێی دەڵێ: زۆریان پێ گوتووی لە مەڕ ترس و تەنگی من، چیت بۆم هیناوە؟»

## پرسیاری مونکر و نەکیر

پێغەمبەر فەرمووی: کە بەندە دەمرێ و لە گـۆڕی دەنـێن، دوو فریـشتە دێـن بـۆ لای، هـەردوویان رووی رەش و چاوی سەوز. یـەکیان مـونکر و ئـەویتریان نـەکیری نـاوە. دەڵـێن: «چ دەڵـێ لەمـەڕ

پێغەمبەر؟» گەر بڕوادار بێ دەڵێ : «بەندەی خودا بوو، پەیغەمبەری خودا بوو، شایەتی دەدەم کە خوایەکەو محەممەد پێغەمبەری خودایە». پاشان حەفتا قۆڵ لە حەفتا قۆڵ گۆڕەکەی بۆ ئاوەلا و پڕتیشک و رووناک دەکەن و دەڵێن: «بنوە». دەڵێ «ئیزنم بدەن با بڕۆمە لای هۆزەکەم و بۆیان بگێڕمەوە». دەڵێن: «بنوە بەو جۆرەی کە بووک دەنوێ، نووستنێ کە هیچ شت بە خەبەرت ناکاتەوە مەگین ئەوشتەی خۆت پێت خۆشە». بەلام گەر دوڕازو دوڕوو بووبێ، دەڵێ: «نازانم، لە خەڵکم دەبیست کە شتێک دەڵێن و منیش دووپاتەم دەکردەوە». بۆیە بە زەوی دەڵێن: «بیرە یەکا» ئەوەندە دێتە یەکا کە تەنشتەکانی بە یەک دەگەن. هەروا ئازار دەردێ تا رۆژی پەسلان.

پێغەمبەر بە عومەری گوت: «ئەی عومەر! چۆن خۆت دەبینی کاتێ کە مردی و خزمانت دەتشۆرن و کفنت دەکەن و لە گۆڕێکی چوارگەز لە گەزێکدا دەتنێژن و خاکت بە سەردا دەکەن و لەوێ بلاوە دەکەن و دەڕۆنەوە و بە تاقی تەنیا دەمێنییەوە و مونکر و نەکیز دێنە لات، دەنگیان وەکوو تریشقەو چاویان وەکوو برووسکەو پرچیان بەسەر خاکدا دەکشێ و بە دانیان خاک هەڵدەکەنن و دەورت دەگرن و دەتلەرێننەوە؟» گوتی: «ئەی پێغەمبەری خودا! ئاوەزم دەگەڵمە؟» فەرمووی: «پێتە». گوتی: «کەواتە خەمم نییەو چاریان دەکەم».

لەخەبەردا هاتووە کە: «لە قەبردا دووگیاندار بەسەر کافردا دادەسەپێنن، هەردوویان کەڕ و کوێرن و هەریەکەیان رمبێکی ئاسنی لە دەستدایە، بەوە تا رۆژی پەسلان لێی دەدەن، نە چاویان هەیە ببینن و بەزەییان پێیدا بێتەوە نە گوێیان هەیە دەنگی بژنەفن و روحمی پێ بکەن». عایشە دەڵێ پێغەمبەر فەرمووی: «گۆڕگوشارێکی هەیە کە مردوو دەگووشێ: گەر تەنیا کەسێک لێی بخەلسێ، ئەوە سەعد کوڕی مەعازە». ئەنەس دەڵێ:« زەینەب کچی پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد. کاتێ نایانە نێو قەبر، رووی پێغەمبەر زەرد هەڵگەڕا. کە هاتە دەرەوە رەنگی وەک خۆی لێ هات. گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە چ بوو؟ گوتی: گۆڕەوشارم هاتەوە یاد، ئاگەداریان کردم کە ئاسانی لێ دەگرین، بەلام هێشتا ئەوەندە گۆڕەکەی گووشای کە هەموو دونیا گوێیان لە دەنگی بوو». پێغەمبەر فەرمووی: «ئازاری کافر لە قەبردا ئەوەیە کە نەوەدونۆ ئەژدیهای بە سەردا دادەسەپێنن، ئەزانی چ ئەژدیهایەک؟ مارێکی نۆسەر، کە تا رۆژی پەسلان دەیگەزن و دەیلێسنەوەو فووی پێدا دەکەن». دیسان فەرمووی: «گۆڕ یەکەم مەنزڵ لە مەنزڵەکانی دوارۆژە، گەر بە سانایی تێپەڕێ، ئەوەی پاش ئەو دێ ساناترە، گەریش بە دژوار تێپەڕێ، ئەوەی پاش ئەودێ دژوارترە».

****

ئەم کتێبەش بە گێرانەوەی ئەو خەونانە کە گەورەکان بە مردووانەوە دیویانە دوایی پێ دێنین.

بزانە کە خەڵکی دونیا ناتوانن بارودۆخی مردوان بزانن مەگین بە موکاشیفە، چ لە خەون و چ

بێداری؛ بەڵام لە ڕێی هەستەکانەوە کەس ناتوانێ سەیریان کاو تێیان بگا، هەروەکوو چۆن گوێ ڕەنگەکانی پێ نابینرێ و چاو دەنگەکانی پێ نابیسرێ. لە مرۆڤدا دانستەیەک هەیە کە بەو دانستە یەک هەیە کە بەو دانستە خەڵکی ئەو دونیایە دەتوانێ ببینێ، بەڵام ئەو دانستەیە پیوارە، لەبەر سەرقاڵی دونیا؛ کە لە خەودا لە سەرقاڵی دونیا ڕزگاری دەبێ بارودۆخی مردوانی پێ پیشان دەدرێ. هەر لەم سۆنگەیە کە ئەوانیش بارودۆخی ئێمەیان لێ خویان دەبێ، تەنانەت بە کردەی چاکمان شاد دەبن و بە خراپەمان خەمبار دەبن، بەو جۆرەی کە لە خەبەرەکاندا هاتووە. ڕاستیەکەی ئەوەیە کە چ ئێمە لەوان و چ ئەوان لە ئێمە بە هۆی لەوحی پارێزراوەوە ئاگاداری یەکتر دەبین. کە مرۆڤ لە دونیا پێوەندی پێوە بکا ئاگاداری مردووان دەبێ، کە ئەوانیش پێوەندی پێوە بکەن ئاگەداری خەڵکی دونیا دەبن. تەختەی پارێزراو[1] وەکوو ئاوێنەیەکە کە وێنەکانی تێدا پیشان دەدرێ، گیانی مرۆڤیش وەکی ئاوێنەیە، گیانی مردووش هەروایە. کەواتە هەروەکوو چۆن لە ئاوێنەیەک شتێک لە ئاوێنەیەکی‌تردا دیار دەبێ، وێنەی یەکتر لە لەوحی پارێزراوی یەکتردا دەبینین. پێت وانەبێ کە تەختەی پارێزراو شتێکە لە بەرد، دار یا هەر شتێکی‌تر چێ کراوەو بە چاوی سەر دێتە دیتن، یان نووسراوەکانی سەری دەخوێنرێنەوە؛ گەر دەتەوێ چاک تێی بگەی لە خۆتدا ڕامێنە. وێنەی هەموو تشتێکی جیهان لە تۆدا ڕانراوە تا بەم چەشنە ڕێ بەریتە سەریان و بیانناسی؛ بەڵام تۆ کە لە خۆت خافڵی چۆن کەسی‌تر دەناسی؟ وێنەی ئەوەش لە خۆتدا مێشکتە کە هەموو قورئانی تێدا دەپارێزی و کە قورئان ئەزبەر دەخوێنییەوە، دەڵێی هەمووی لە مێکشتدا نووسراوەو پیت و وشەو دەنگەکانی دەبینی و دەیانخوێنی، کەچی گەر مێشکت ورد ورد بکرێتەوە، بەم چاوی سەرە لە هیچ کوێیدا قورئانێ کە نووسرابێ دیار نییە. کەواتە نوخشە بەستنی کارەکان لە تەختەی پارێزراوادا دەبێ لەم چەشنە بزانی کە بێ ڕادە کاری تێدا نووسراوە، کەچی چاوی تۆ ڕادەدارەو بێ ڕادەی تێدا کۆوەنابێ. تەختەی ئەو و قەڵەمی ئەو و دەستی ئەو تەنانەت خودی ئەو هیچ لە تۆ ناکەن، بەڵکوو بەو چەشنەیە کە گوتوویانە: «ماڵ لە خاوەن ماڵ دەکا».

مەبەست ئەوە بوو کە بزانی زۆر سەیرو نەشیاو نیە کە ئەوان ئاگاداری ئێمەبن و ئێمەش ئاگەداری ئەوان. ئەوەی کە مردووان لە خەودا دەیبینن - چ لە بارێکی خراپ یان چاک - بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە زیندوون و نەمردوون، چ لە نێو نیعمەتدا بن چ لە ئازارو ئەشکەنجەدا؛ هەروەها نەفەوتاون و نەمردوون، هەروەک گوتی: وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ[2].

---

١ ـ تەختەی پارێزراو: لوح محفوظ.

٢ - (قورئان، ١٦٩/٣) ئەو کەسانەی کە لە ڕێی خودا کوژراون هەرگیز نابێ بە مردوویان حیساب کەن؛ هەر زیندوون و خودا بژیویان دەداتێ. (هـ)

## شرۆڤەی بارودۆخی مردووان کە لە ڕێی خەونەوە ئاشکرا بوون

پێغەمبەر فەرمووی: «هەرکەس منی بە خەو دی، خۆمی دیوە؛ چونکە شەیتان ناتوانێ لە ڕواڵەتی مندا خۆی بنوێنێ».

عومەر گوتی: «پێغەمبەرم لە خەودا بینی، دەگەڵم سەرگران بوو. گوتم: چ بووە؟ گوتی: "تۆ ئەوە نیت کە لە ڕۆژوودا خێزانەکەت ماچ دەکەی؟"» عومەر ئیدی چجار وای نەکرد. هەرچەن ئەم کارە حەرام نییە، بەلام نەکردنی چاترە؛ لەم وردەکارییانەدا لە ڕاستبێژان ئاسان ناگیرێ، هەرچەن بۆ کەسانیتر ئاسانگیری دەکرێ.

عەبباس دەڵێ: «دەگەڵ عومەر گەلێک دۆست بووین، ویستم پاش مردنی بە خەو ببینم و ئاگەداری بمەوە. پاش یەک ساڵ بینیم، چاوی دەسڕی؛ گوتی: ئێستا لە پرسینەوە بوومەوە؛ کارێکی زۆر ئەستەم بوو؛ گەر لەبەر بەزەیی خودا نەبایە ڕزگار بوونم ئەستەم بوو».

هەروەها عەبباس دەڵێ: «ئەبوولەهەبم بە خەو بینی کە لە ئاوردا دەسووتا، گوت: "هەمووکات لە سزادام مەگەر شەوانی دووشەمە؛ چونکە شەوی دووشەمە بوو کە ئاگەداریان کردم پێغەمبەر هاتە دونیا، زۆر پێی شاد بووم، بەندەیەکم ڕزگار کرد؛ لە پاداشی ئەوەدا شەوانی دووشەمە ئازار نادرێم"».

عومەری عەبدولعەزیز دەڵێ: «لە خەوما پێغەمبەرم بینی کە ئەبووبەکر و عومەر لە لای دانیشتبوون. کە منیش لە لایان دانشتم، عەلی و مەعاویەیان هێناو بردیاننە ژوورێکەوەو دەرگاکەیان گالەدا. دەم ودەس عەلیم بینی کە هاتە دەرەوە و گوتی: قُضِيَ لِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ: واتە مافی منیان بە جێ هێنا. دوابەدوای ئەو مەعاویە هاتە دەرو گوتی: غُفِرَلِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ: لە منیش بوردن».

جارێک ئیبنی عەبباس لە خەو ڕاپەڕی -بەرلەوەی حوسەین بکوژرێ- گوتی: «اِنا لِلّهِ وَ اِنا اِلَيهِ راجِعُونَ» گوتیان: «چ بووە؟» گوتی: «حوسێنیان کوشت». گوتیان: «چۆن دەزانی؟» گوتی: «پێغەمبەرم دی کە دەفرێکی شووشەیی پڕ خوێنی لە دەستدا بوو گوتی: "دەبینی کە ئوممەتەکەم پاش خۆم چەیان کرد، ڕۆڵەکەمیان کوشت و ئەمەش خوێنی حسەین و یارەکانیە بۆ دادخوازی دەیبەمە لای پەروەردگار"». پاش بیستوچوار ڕۆژ هەواڵی کوشتنی حسەینیان هێنا.

سدیقیان بە خەوبینی و پێیان گوت: «هەر کات ئاماژەت بە زارت دەکردو دەتگوت ئەمە کارەکانی لە پێشم ڕاناوە». گوتی: «هەروایە، هەروایە بەمە "لااِلهَاِلااللّه"م دەگوت، بەهەشتی نایەپێشم».

یووسف کوڕی حوسێنیان بە خەوبینی، گوتیان: «خوای مەزن چی لەگەڵ کردی؟» گوتی: «بەزەیی پێمدا هات». گوتیان: «بۆچی؟» گوتی: «چونکە قەد ڕاستی و گەمەم ئاوێتە نەکرد».

مەنسوور کوڕی سمائیل دەڵێ: «عەبدوللای بەزازم بە خەوبینی، گوتم: پەروەردگار چی لەگەڵ

کردی؟ گوتی: هەرگوناحێک کە پێ هاتم و دانم پێدانا، بەخشی، بێجگە یەک گوناح کە لە رووم هەڵنەدەهات دانی پێدا بنێم، ئەوەندە لەسەر پێوە رایگرتم و ئارەقەی شەرمم دەردا کە هەموو گۆشتی ئەنامم داوەری». گوتم:«ئەوە چ بوو؟» گوتی:«جارێک سەیری خولامێکم دەکرد، زۆرم لە لاجوان و بەدەو بوو، لە رووم هەڵنەهات دانی پێدا بنێم».

ئەبووجەعفەری سەیدەلانی دەڵێ: «لە خەودا دیتم کە تاقمێ سۆفی لەگەڵ پێغەمبەر دانشتبوون. دوو فریشتە لە ئاسمان هاتنە خوارو یەکێکیان ئافتاوەیەک و یەکیان تەشتێکی پێ بوو. پێغەمبەر دەستی شوشت و سۆفییەکانیش هەروا. بۆ منیان راگرت کە دەستم بشۆم، یەکێک گوتی بۆ ئەوی مەگرن، ئەو لەمان نییە. گوتم: یا رەسووڵەڵڵا! لە تۆ دەگێرنەوە کە گوتووتە هەرکەس تاقمێکی خۆش بوێ، ئەویش لەوانە. من ئەم تاقمەم خۆش دەویست. فەرمووی: بۆی راگرن دەستی بشوا، ئەمیش لەمانە».

«مجمع»یان بە خەو بینی، گوتیان: «کاری خۆت چۆن بینی؟» گوتی: «خێری دونیاو دوارۆژ پارێزکاران دەیبەن.

«زرارەبن ابی اوفی»یان بە خەو بینی. گوتیان:«لە کردەوەکان کامیان هێژاترن؟» گوتی:«رەزا بە ویستی خوداو ئاواتی کورت».

یەزید کوڕی مەزعوور دەڵێ: «ئەوزاعیم بە خەو بینی، گوتم: لە کردەوەیەکی چاک ئاگادارم کەوە، با بەو بۆنەوە بێمە ریزی نزیکانی خوا. گوتی: هیچ پلەیەک سەرتر لە پلەی زانایانم نەدی، پاش ئەوەش پلەی خەمباران». ئەم یەزیدە پیرە پیاوێک بوو، پاش ئەم خەوە بەردەوام دەگریا تا کوێر بوو و مرد.

ئیبنی عەینییە دەڵێ: «براکەم بە خەو دی، گوتم خوا چی لە گەڵ کردی؟ گوتی: "هەرگوناحێک کە پاش ئەوە تەوبەم کردبوو، بەخشی، هەرچی داوای لێبوردنم نەکردبوو نەیبەخشی"».

زبەیدەیان بە خەو بینی، گوتیان: «خودا چی لەگەڵ کردی؟» گوتی: «رۆحمی پێکردم». گوتی: «بەو سامانەی کە لە رێی مەککەدا خەرجت کرد؟» گوتی:«نە، چونکە پاداشی ئەوە درایە خاوەنەکەی، منیان بە بۆنەی نییەتمەوە بەخشی» سەفیانی سەوریان بە خەو بینی، گوتیان:« خوداچی لەگەڵ کردی؟» گوتی:«هەنگاوێکم نایە سەر سیرات، ئەویترم نایە نێو بەهەشت».

«احمدبن الحواری» دەڵێ: «ژنەکەمم بە خەو بینی، لەبەر جوانی رووی وەک هەتاو دەدرەوشا، قەد وانەمدیبوو، گوتم: "ئەم روونـاکی ناوچەوانت لەبەر چییە؟" گوتی: "لە بیرتە فلان شەو پەروەردگارت یاد کردو دەگریای؟" گوتم: "لە بیرمە". گوتی: "فرمێسکەکانتم لە رووی خۆم مالی، ئەم تیشکە هی ئەوەیە"».

کەتانی دەڵێ: «جونەیدم بە خەو بینی، گوتم: "خودا چی دەگەڵ کردی؟" گوتی: "ئەو هەمگە

عیبادەت و هێمایانە هیچ نەبوون، هەموویان با بردنی. هیچ کەڵـکیان نـەبوو، بێجگـە ئـەو دوو ڕەکاتـە نوێژە کە شەوانە دەمخوێند"».

زبەیدەیان بە خەو بینی، گوتیان: «خودا چی دەگەڵ کردی؟» گوتی: «خـوا بـە بۆنـەی ئـەم چـوار رستەوە کە دەمگوت، بەزەیی پێمدا هاتەوە: لاالهَ الاّالله اَفْنی بِها عومری، لاالهَ الاّالله اَدْخُلُ بِها قَبْـری، لاالـهَ الاّالله اَخْلُوبِها وَحْدی، لاالهَ الاّالله اَلْقی بِها رَبّی».

بێشریان بە خەو بینی، گوتیان: «خودا چی دەگەڵ کردی؟» گوتی: «بەزەیی پێمـدا هاتـەوەو پێـی گوتم: "شوورەییتیان نەدەکرد ئەوەندە لێم دەترسای؟"»

ئەبوسلەیمانیان بە خەو بینی، گوتیان: «خوا چی دەگەڵ کردی؟» گوتی: «بەزەیی پێمـدا هاتـەوەو هیچ شت بەقەدەر ئەوەی لە ناو خەڵکدا ناوبانگی دینداریم دەکردبوو بۆم زیانی نەبوو».

ئەبووسەعیدی خەڕراز دەڵێ:«شەیتانم بە خەو بینی. گۆچـانێکم هەڵـگرت کـە لێـی بـدەم، هـیچ نەترسا، دەنگێک پێی گوتم: "لەوە ناترسێ، لەو تیشکەی دەترسێ کە لە دڵت دایە"».

مەسووحی دەڵێ: «شەیتانم بە رووتی لە خەودا بـینی، گـوتم: "شـەرم ناکـەی لـە خەڵـکوخـوا؟" گوتی: "ئەمانە مرۆڤ نین، گەر مرۆڤ بایەن من وەکوو چۆن منداڵ تۆپێن دەکا، یاریم پێ نـەدەکردن؛ مرۆڤ تاقمێکیترن کە منیان زارو بیمار کردووە"، مەبەستی سۆفییەکان بوو».

ئەبووسەعیدی خەڕاز دەڵـێ: «لـە شـامدا بـووم، دیم پەیغەمبـەر لـە دوورەوە دێ و پاڵـی داوە بـە ئەبووبەکرو عومەرەوە. من بەیتم دەخوێندو قـامکم بەسـەر سـنگمدا دەدا. گـوتی:"شـەڕی ئەمـە لـە خێری زۆرترە"».

پاش سێ رۆژ لە مردنی شبلی، بە خەو بینیان، گوتیان: «خوا چـی دەگـەڵ کـردی؟» گـوتی: «لـە حسێبمدا تەنگی پێ چنیم تا هیوام بڕا، کە نائومێدی منی بینی، بەزەیی پێمدا هاتەوە».

سەفیانی سەوریان بە خەو بـینی، گوتیـان: «خـودا چـی لەگـەڵ کـردی؟» گـوتی: «رەحمـەت». گوتیان: «عەبدوڵلای مبارەک چۆنە؟» گوتی: «هەر رۆژ دووجار هەڵیدەبڕن تا خودا ببینێ».

مالک کوڕی ئەنەسیان بە خەو بینی، گوتیان: « خودا چی لەگەڵ کردی؟» گـوتی: «رسـتەیەک لـە عوسمانی کوڕی عەفان فێر بووم کە دەیگوت هەرگا مردوویەکتان بینی بـڵێن: "سُـبحانَ الْحَـی الَّـذی لایموُت" بە گوتنی ئەوە رزگار بووم».

ئەوشەوەی کە حەسەنی بەسری رووی لە جیهانی هەرەمانەوە نـا، بـە خـەو بینییـان کـە دەرگـای ئاسمانەکان ئاوەڵایەو گاس دەکەن: «حەسەنی بەسری خودای بینی و لێی رەزابوو».

جونەید ئیبلیسی بە خەو بینی کـە رووت و قووتـە، گـوتی:«شـەرم لـە خەڵـکی ناکـەی؟» گـوتی:

«ئەمانە کەی مرۆڤن، مرۆڤ ئەوانەن کە لە مزگەوتی شونیزیەدان و منیان وەڕس کردووە». گوتی: «بەیانی ڕۆیشتم بۆ مزگەوتی شونیزیە، کە لە دەرگا ڕۆیشتمە ژوور بینیم سەریان لە کۆش ناوە و خەریکی بیر کردنەوەن، گوتیان: "بە قسەی ئەو لەحنەت لێکراوە فریو مەخۆ"».

«عتبه الغلام» یەکێک لە حوورییەکانی بەهەشتی بە خەو بینی، ئێجگار جوان و شووشەیی بوو. گوتی: «ئەی عوتبە! من ئەویندارى تۆم، ئامانە نەکەی کارێک کەی کە منت لێ کەن». عوتبە گوتی: «دونیام سێ تەلاقە کردەوە تا ئەو ڕۆژەی دەگەم بە تۆ».

ئەبوو ئەیووبی سەختیانی تەرمی پیاوێکی خراپکاری بینی، ڕۆیشتە سەر بەرزاییەک تا نوێژی لەسەر نەکا. ئەو مردووەیان بە خەو بینی، گوتیان: «خوا چی لەگەڵ کردی؟» گوتی: «بەزەیی پێمدا هاتەوەو گوتی بە ئەبووئەیووب بڵێن: قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ إِذٗا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِ[1]؛ واتە: گەر خەزانەی ڕەحمەتی خودا لە دەستی ئەنگۆبایە، لەبەر ڕژدی هیچتان بە کەس نەدەدا».

ئەو شەوە کە داوودی تایی کۆچی دوایی کرد، یەکێک بە خەو بینی کە فریشتەکانی ئاسمان لە هات و چۆدان، گوتی: «ئەمشەو چ باسە؟» گوتیان: «ئەمشەو داوودی تایی کۆچی دوایی کردووەو بەهەشتەکانی بۆ دەڕازێننەوە».

ئەبوو سەعیدی شەحام دەڵێ: «سەهلی سوعلووکیم بە خەو بینی، گوتم: "خواجە!" گوتی: "واز لە خواجەیی بێنە، هیچی لێ نەما". گوتم: "ئەو هەمگە کاروچاکەت گەیشتە کوێ؟" گوتی: "هیچ کەڵکیان نەبوو، بێجگە پەرسڤی ئەو پرسیارانەی کە پیرەژنان دەیانپرسی"».

ڕەبیع کوڕی سلەیمان دەڵێ: «شافیعیم بە خەو بینی، گوتم: "خوا چی لەگەڵ کردی؟" گوتی: "لەسەر کورسییەکی زێڕینی دانام و مرواری تەڕی بە سەردا کووشام"».

شافعی دەڵێ: پرسێکم بۆ هاتبووە گۆڕێ، تێیدا دامابووم، لە خەودا بینیم کە یەکێک گوتی: «ئەی محەممەدی کوڕی ئیدریس! بڵێ: "اَللّهُمَّ لا اَملکُ لنَفسی نَفعاً و لاضَراً و لامَوْتاً و لاحَیوةً وَ لانُشوراً وَ لا اَستَطیعُ اَن آخُذُ الاّ ما اَعطَیتَنی وَ لااَتقیَ الاّ ما وَقَیتَنی؛ اَللّهُمَّ وَفِّقنی لما تُحبُّ وَ تَرضی منَ القَولِ والعَمَلِ فی عافیَة"[2]. بەیانی کە لە خەو هەستام ئەم دوعایەم کرد، لە چاشتەنگاودا ئەم پرسیارەم لەبەر ئاسان بوو و وەرامەکەم دیتەوە. ئەم دوعایە لە بیر مەکەن».

---

١ - قورئان، ١٧/١٠٠.

٢- خوایا! زیان و قازانج و مردن و ژیان و هەستانەوەی من بە دەستی من نییە، دەستم بە هیچ ڕاناگا، مەگەر تۆ پێمی بدەی، لە هیچ شت خۆمم پێ ناپارێزرێ، مەگین تۆ بمپارێزی. پەروەرندەم! لەسەر ئەو شتەی کە پێت خۆشە و پەسندی دەکەی، لە وتەو کرداری جوان، سەرکەوتوو و بەختەوەرم کە.

یەکێک دەڵێ: «عتبەالغلام»م بە خەوبینی، گوتم: خودا چی لەگەڵ کردی؟ گوتی: بـە بۆنـەی ئـەو دۆعای کە لەسەر دیوارەی خانووەکەتدا هەڵواسراوە، رەحمی پێکردم. لـە خـەو رابـووم، سـەیرم کـرد دوعایەک بە قەلەمی عوتبە لە سەر دیواری خانووەکەم نووسـرابوو «یا هادیَ الْمُضِلّینَ وَیا راحِـمَ الْمُـذنبینَ وَیا مُقیلَ عَثَراتِ الْعاثرِیَن، اَرْحَمْ عَبْدکَ ذَاالْخَطرِ الْعظیم، وَالْسُلْمینَ کُلّهُم اَجْمَعین، واَجْعَلْنـا مَـعَ الاحیـاءِ الْمـرَزوقین، اَلذینَ اَنْعَمْتَ عَلَیْهِم مِنَ النبیّینَ وَالصدیّقینَ وَالشُّهَداءِ وَالصّالحین، آمین یارَبّ الْعالَمین»[1].

ئەمەی کە بێژرا بەستە بـۆ باسـی مـردن. ئـەم کتێبـەش لێـرەدا دوایـی پێـدێنین و هیـوادارم کـە هەرکەس ئەم کتێبە دەخوێنێتەوەو بەهرەی لێ دەگـرێ، نووسـەری ئـەم دێڕانـە بـە دوعـای بـەخێر بەسەر کاتەوەو لە پەروەردگاری مەزن داوای لێبوردنی بۆ بکاو تەنانەت گەر هەڵەیەک و کـەموکـورتی و خوارییـەک لـەم نووسـراوەدایە، یـان ئەگـەر تووشـی مـەرایی هـاتووەو نییـەتی بێخـەوش نیـیە، پەروەردگاری مەزن بە گەورەیی و دلۆڤانی و دلاوایـی خـۆی و لەبـەر دوعـای خوێنـەران لـە هەڵـەم خۆش بێ و لە پاداشم بێ بەش نەکا؛ چونکە هـیچ زیـان و خەسـارێ پتـر لـەوە نییـە کـە کەسـێک خەڵک بۆ لای خوا گاس بکاو خۆی لەبەر سەرنجی خەڵک، لە خوا دوورکەوێ :

نَعوذُ بِاللهِ مِن ذَلکَ. فَنَقوُلُ فِی خاتمةِ الکتاب:

اَللّهُمَّ اِنّا اَنعُوذُبِعفُوکَ مِنْ عِقابِکَ، وَنَعوُذُ بِرِضاکَ مِنْ سَخَطِکَ، وَنَعُوذُبِکَ مِنکَ. لاتُحْصی ثَناءٌ عَلَیْکَ، اَنتَ کَما اَثْنَیْتُ عَلی نَفْسِکَ. وَالْحَمدُلِلهِ رَبِّ الْعالَمینَ وَالصَّلوةُ عَلی مُحَمَّدٍ وَ آلِهِ الطَیّبینَ الطّاهرِیَنَ»[2].

---

١ - ئەی رێنومای بزربووان! ئەی بەخشندەی گوناحکاران و ئەی ئەو کەسەی لە رێلادەران دەبووری! لەم مەترسییە گەورەیـەدا ئـەم بەندەیەت بپەرێنەوە، هەروەها سەرجەمی موسولمانان. ئێمە لە ریزی زیندووانی رۆزیخۆری خۆت دابنێ، ئەوانەی لـە پێغـەمبـەران و راستبێژان و شەهیدان و چاکەکاران کە نیعمەتی خۆتت لێیان دریخ نەکرد. پەرسـڤی ئـەم سـکالایەمـان بگێـرەوە ئـەی راهێنـەری جیهانیان.

٢ ـ پەنا دەبەمە بەر پەروەرندەم. لە کۆتایی ئەم کتێبەدا دەڵێم: پەروەرندەم! لە ئازارەکان پەنا بە لێبوردنت دەبەین، لـە تووڕەییـت بـە رەزامەندیت، لە خۆت بە خۆت پەنادەبەین. سپاسی تۆ لە ژمارنایە، تۆ هەربـەو چەشـنەی کـە خۆتـت پەسـن کـردووە. سـوپاس بـۆ خودایەک کە راهێنەری جیهانە، سـلاو لە محەممەدو بنەماڵەی پاراو و داوێن پاکی.

باش بزانە کە کلیلی ناسینی خوای مەزن، خۆناسییە؛ بۆیە گوتوویانە مَن عَرَفَ نَفسَهُ فَقَد عرف ربە؛ خواش فەرمووی: سَنُرِيهِمۡ ءَايَـٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ [1]؛ بە گشتی هیچ شتەک لە تۆوە بە تۆ نزیکتر نییە؛ کەواتە، تۆ کە خۆت نەناسی، چۆن کەسیتر دەناسی؟ ڕەنگە بڵێی خۆم دەناسم، کەچی هەڵە دەکەی و ئەو ناسینە کلیلی ناسینی خوداوەند نییە. بەڵکم چوارپێش هەر ئەو جۆرە خۆیان دەناسن: بێجگە لە دەست و پێ و سەرو ڕوو و گۆشت و پێستی ڕواڵەتت چی دی ناناسی. لە دەروونی خۆشت هەر ئەوەندە دەزانی کە برسیت بوو، بخۆی و توورە بووی، بە شەڕ بی و شاوەتت زۆری هێنا، ژن بێنی و لەمانەشدا هەموو حەیوانێک دەگەڵت یەکسانن. کەواتە لەسەرت پێویستە کە ڕاستەقینەی خۆت ببینیتەوە و بزانی لە کوێرا هاتووی، بۆچی هاتووی و بۆ کوێ دەڕۆی؛ بۆ هاتوویتە ئەم هەوارگە و هۆی هاتنت بزانی و تێبگەی بەختەوەریت چییە و لە چییایە؛ کۆڵەواریت چییە و چۆن دەتوانی خۆتی لێ بپارێزی.

(لاپەڕەی ٨)



سنندج • خیابان شهداء • پاساژ آبیدر
تلفن: ۲۲۷۲۱۱۵ - ۰۸۷۱



9 786009 114856